(ئاتەشبازی بەکنگی خاڵی ناکرێ) [ف] آتشبازی.

**ئاتـەشپارە:** ١) بە منالی هاروهاج دەڵێن: (منداڵەکەیان چەند شەیتانە هەر **ئاتەشپارە**یە)؛ ٢) بە پیاوی زۆر زرینگ‌و ئازا لە شەڕو بازرگانی‌دا دەڵێن: (فلان لە شەڕدا **ئاتەشپارە**یە) [ف] ١) بچۀ بازیگوش، آتشپارە؛ ٢) مردی کە در تجارت یا در جنگ زیرك باشد.

**ئاتەشخان:** ١) تونخانەی حەمام؛ ٢) قوڵکەی ژێر تیانە کە ئاگری تێدا دەکەنەوە [ف] ١) آتشدان حمام؛ ٢) اجاق سنگی.

**ئاتەشخانە:** تەندورەی سەماوەر، پەنگردانێ سەماوەری چای‌چێ کرنێ [ف] آتشخانۀ سماور.

**ئاتەشکەدە:** کوانوی ئاگرپەرستان، ئاگردانی پیرۆزی گاوران [ف] آتشکدە.

**ئاتەشگا:** ١) ئاتەشکەدە؛ ٢) ناوی کێوێکە لە کوردستان [ف] ١) آتشکدە؛ ٢) نام کوهی در کردستان.

**ئاتەشی:** ١) رەنگی گوڵی سوری تاریك؛ ٢) پیاوی زۆر توندە تەبیات، بەبنیام تۆرە ئەیژن [ف] ١) رنگ سرخ آتشی؛ ٢) آدم آتشین‌مزاج.

**ئاتـەگ:** ١) داوێنی کەوای شۆڕ: (نـوێژی لەسـەر ئاتـەگی دەکـرێ)، شاقـەل؛ ٢) بریەتیە لەبنـارو دامێنی‌چیا [ف] ١) دامن قبای بلند؛ ٢) دامنۀ کوه.

**ئاتی:** زێڕ، تەلا، ئاڵتون [ف] طلا.

**ئاجاخ:** دیاردی‌و ئاشکر، خویا [ف] آشکار.

**ئاجاڕ:** پنجاڕ، رەگ‌و بنی گیا [ف] بیخ و ریشۀ گیاهان.

**ئاجگی:** دەست رژد، خەسیس، چکوس، دەست‌قوچاو [ف] خسیس.

**ئاجـوج:** دەگەڵ ماجوج دەگوترێ و ناوی هۆزێکی چیرۆکی‌یە. *دەڵێن پادشـایەکی دوشـاخ (ذوالقـرنین) گرتونی‌و دیواری بەردینی لەپێش هەڵچنیون* [ف] یأجوج.

**ئاجۆر:** خشتی لم‌و رەڵمی سوورەوەکراو، کەرپوچ [ف] آجر.

**ئاجیل:** چەرەز، بادام‌و نۆك‌و تۆم‌و تۆکولەکەی شەوچەرە [ف] آجیل.

**ئاچـخ:** رەنگی کاڵ، بەرانبەر بە رەنگی تاریك‌و تۆخ: (پارچەی کەواکەم شینی **ئاچخە**) [ف] رنگ روشن.

**ئاچوخ:** ١) ئاچخ؛ ٢) وەکری، ئاواڵە، بەرانبەری داخراو: (دەرگا کەتان ئاچوخ بو، دانەخرابو) [ف] ١) رنگ روشن؛ ٢) باز، مقابل بستە.

**ئاچەر:** کلیل، هاچەر [ف] آچار.

**ئاخ:** ١) هاوار لەبەر ئازار؛ ٢) خۆزیا: (**ئاخ** هێندە نەدەمردم کوردستانم بە رزگاری دەدیت)؛ ٣) خاك، خۆڵ: (هەرچێکی لەناخی **ئاخ**و دەریان / هی‌چۆتـە بنـاو ئەوی لەسـەریان) «مەم‌وزین»؛ ٤) وشەی دەربڕینی شادی: (**ئـاخ** ئەم داوەتـە چەنـد خۆشـە!) [ف] ١) حرف درد، آخ؛ ٢) کاشکی؛ ٣) خاك؛ ٤) حرف تعریف، بەبە.

**ئاخا:** ئاغا: (من ئاخاو تۆ ئاخا، ئەی کێ جێمان بۆ ڕاخا؟) «مەسەل» [ف] آقا.

**ئاخافتن:** قسەکردن، پەیڤین، ئیشتیغالی، گوتن، وتو وێژ [ف] گفتگو.

**ئاخایۆك:** بە کەسێ دەڵێن کە خۆی بە گەورە دەزانێ‌و لە گەورەیی نازانێ [ف] خودبزرگ‌بین.

**ئاخباران:** تۆزباران، تەپ‌وتۆز، تۆزوغومار، تۆزو خۆڵ کە بەدەم باوە دا دەبارێ [ف] بارش گردوغبار.

**ئاخبان:** گڵەبان، ئاخەبان، بانەناو [ف] گل اندود بام.

**ئاخچەباش:** گیایەکە لەریزی گیا دوکڵیوان [ف] گیاهی است.

**ئاخدار:** خەمبار [ف] غمگین.

**ئاخر:** ١) بەرانبەری هەوەڵ، دوایین؛ ٢) مەگەر: (**ئاخر** نەمگوت باش‌بەو جاش مەبـە؟)؛ ٣) دەسـا، ئیتر: (**ئاخر**وا نابێ وەك تۆ دەیکەی)؛ ٤) بڕانەوە، دوایی هاتن: (تۆزێك رۆت خۆش بێ خۆ دنیا **ئاخر** نابێ)؛ ٥) بەسەرهاتی دواڕۆژ: (وەفایی **ئاخری** خێر بێ دەمێکە بێ‌سەرو شوێنە) [ف] ١) انتها؛ ٢) مگر؛ ٣) اینکە؛ ٤) پایان؛ ٥) عاقبت، آخرت.

**ئاخرخێر:** پیری پیاوچاك [ف] نیك‌فرجام.

**ئاخرزەمان:** بەو رۆژگارە دەڵێن کە کەوتۆتە دوای پێغەمبەری ئیسلامەوە [ف] آخرالزمان.

**ئاخرشەڕ:** پیری بەدفەڕو نەگریس: (پیری **ئاخرشەڕ** وەتەنت فرۆشت / ئابڕوت گۆڕیەوە بە پلاوو گۆشت؟!) «هەژار» [ف] بدفرجام.

**ئاخرکە:** ئاخویرك، مێشولەی زۆر ورد [ف] پشۀ خاکی.

**ئاخروئۆخر:** نیزیك بە بڕانەوە: (لە **ئاخرو ئۆخری** پاییزدا میوانی بوین) [ف] اواخر.

**ئاخرەت:** سلا، رۆژی قیامەت، پەسلان، هەستانەوەی پاش مردن [ف] آخرت.

**ئاخـرەمین:** هەرەپاشین: (ئـەوە **ئاخرەمین** جار بێ‌پێت بڵێم، ئیتر پێت ناڵێمەوە) [ف] واپسین.

**ئاخـری:** ١) دوایی: (**ئـاخری** ملی‌داو هات)؛ ٢) لەپرسیاردا: (**ئاخری**؟ دەی دوایی چی؟) [ف] ١) سرانجام؛ ٢) عاقبت چە شد؟.

**ئاخسبات:** پازدە رۆژی ئاخری چلەی زستان [ف] دوهفتۀ آخر چلۀ زمستان.

**ئاخش:** ئۆخەی، ئای چەند خۆشە [ف] آخیش.

**ئاخڵە:** ١) خەرمانەی مانگ: (**ئاخڵە** لەدەوری مانگ دیارە)؛ ٢) پاپۆکەی مار: (مـارەکـە **ئاخـڵەی** دابـو)؛ ٣) بە ژورێکـی کورتـەدیواری سەردانەپۆشراو دەڵێن کە بۆ کاو گیا ساز دەکرێ [ف] ١) هالۀ ماە؛ ٢) چنبرە زدن مار؛ ٣) کاهدان.

**ئاخڵەوێك:** تاوەی شت تێدا سورکردنەوە [ف] تابە.

**ئاخلێف:** بافیش‌و دەلەسەو درۆ، قڕ [ف] مکر و دروغ.

**ئاخلێقە:** هەوەڵ بەهار کە شینکە بەحاڵ‌و حاستەم سەری دەرێناوە. *لەو سەردەمـەدا کە ئاژەڵ دەلـەوەڕێ خۆڵ‌و گیا پێکـەوە هەڵدەگرێ، ئاخ بەلێویەوە دیارە* [ف] سرآغاز بهار.

**ئاخن:** پەستاوتە، ناوەڕۆك: (نێوئاخنی لێفەکە لۆکەیە) [ف] آگنە.

**ئاخناو:** تێ‌پەستراو، پەستواو: (شیزە هەتاملان لەرۆن ئاخناوە) [ف] آکندە.

**ئاخندراو:** ئاخناو [ف] آکندە.

**ئاخنراو:** ئاخناو [ف] آکندە.

**ئاخنەبا:** دواڕۆژەکانی زستان، دەمێ کە حەوت رۆژ لەچلەی چوك مابێ [ف] هفتۀ آخر چلۀ زمستان.

**ئاخنین:** تێ‌پەستاوتن، بەزۆر تێڕا کردن [ف] آکندن.

**ئاخنینـەوە:** ئاخنین: (خەریکی **ئاخنینەوەی** پیستە پەنیرانم، دوپیستەم **ئاخنیوەتەوە**) ف آکندن.

**ئاخـــۆ:** ئایا، تو بیژی، لەوانـــەیە: (سـەری هەردوکـولمی **ئاخـۆ**، گولی نەوبەهارە یاخۆ / طَرَفی نەهارە زولفی، زُلَفٌ مِنَ اللَّیالی) «نالی» ف آیا، تو گویی.

**ئاخوا:** ئاخۆ ف آیا، تو گویی.

**ئاخور:** شوینیهەلبەستراوبۆ جیێ خۆراکی ئاژەڵ، ئالفدان، ئافر ف آخور.

**ئاخۆران:** دەگەڵ *باخۆران* دیت. ١) بشێوە، بشێوی و ئاژاوە: (**ئاخۆران** باخۆرانیکە سەگ خاوەنی خۆی ناناسێ)؛ ٢) کۆمەڵی دزو تالانچی: (ئای لەو **ئاخۆران باخۆرانە**، خۆ هیچیان پێ نەهێشتن) ف ١) هرج و مرج و آشوب؛ ٢) حرامیان.

**ئاخون:** ١) مەلای عەجەمان؛ ٢) نینۆك ف ١) آخوند؛ ٢) ناخن.

**ئاخوند:** مەلای عەجەمان ف آخوند.

**ئاخویرك:** جۆرە مێشوڵەیەکی زۆرورد، پێشی گەلەك هوُر ف نوعی پشهٔ بسیار ریز.

**ئاخەبان:** ١) گڵەبان، بانەناو؛ ٢) بانی لێك و لوس ف ١) گل اندود بام؛ ٢) بام بدون ترك خوردگی و صاف.

**ئاخـەبانو:** جامانە، ئاغابانو، تەنراویکی سپی، رەش یا سپی و سورە کە پیاوان لەسەری دەبەستن ف نوعی دستار مردانه.

**ئاخـەلیوە:** ئاخلیقـە، کاتی تازە شین‌بونی دەشت، سەرەتـای بەهار ف اوایل بهار.

**ئاخ هەڵکێشان:** لەخەمان ئاخ‌وداخ گوتن ف حسرت خوردن.

**ئاخی:** یاخی، یاغی، سەرکێش، پێ‌چەقین ف یاغی.

**ئاخیز:** ١) نیوەهـەڵسان: (چویە ماڵی مام‌پیرۆت لەبەرت هەستا؟ بەخوا نەتـەواو، هەروا **ئاخیزێکی** کرد)؛ ٢) هەستـان بەتـەواوی: (بـانو نێد شنەفت نەجا کرد ئاخیز) «خانای قوبادی» ف ١) نیم‌خیز؛ ٢) برخاستن.

**ئاخیە:** گوڵمێخ، سنگی ئاسنی ئاڵقـەدار یا سنگی ئەستوُری دارین ف میخ آخور.

**ئاخین:** ئاخ هەڵکێشان ف آه سردادن.

**ئاد:** دورگە، جزیرە، وشکانی لەناو ئاودا ف جزیره.

**ئادا:** ١) دڵاوایی، سەخاوەت؛ ٢) پسپۆڕی، لێزانی ف ١) سخاوت؛ ٢) مهارت.

**ئادار:** مانگی رۆمی، بیست رۆژ لە خاکەلێوەو دەرۆژ لە رەشەمە ف ماه مارس.

**ئاداروك:** گوڵێکە لەسەر بەهاردا دەپشکوێ ف گلی است که اوایل بهار می‌روید.

**ئادان:** زەوی بەپیت و بەرەکەت ف زمین حاصلخیز.

**ئادودە:** قامیش یا داری درێژ کە ماڵی پێ پاك دەکەنەوە ف گردگیر.

ئادە: ١) تەڵە کەوریشك، جۆرێك تەڵەی لەدار؛ ٢) بژاری گیا لە شینایی ف ١) نوعی تله؛ ٢) وجین.

**ئادەر:** کەحێل، جسن، رەسەن، حدود ف اصیل، نجیب.

**ئادەم:** بابەدەم، مێردی دایکەوا، هەوەڵین باپیری مرۆ ف حضرت آدم.

**ئادەمی:** مرۆ، عیسان، بەشەر ف آدمی.

**ئادەمیزا:** مرۆ، ئادەمی ف آدمیزاد.

**ئادەمیزاد:** ئادەمیزا ف آدمیزاد.

**ئادی:** ١) ئەویتر، ئەویکە؛ ٢) بۆچەنە ف ١) آن دیگر؛ ٢) چرا، درست است.

**ئادێ:** ئەوان، ئەوانە ف آنها.

**ئادێچی:** ئەوانی دی، ئەوترەکان ف آن دیگران.

**ئادی‌شا:** ئەوان خۆیان ف ایشان.

**ئار:** ١) ئارد، دەغڵی هاڕیاوی ئامـادەی نان؛ ٢) جێگـە: (**نزار** یا **نسار**: جێی نســێ، هەوار: جێی هەوا ، شار: شوێنـــی گەورە)؛ ٣) ئاگر: (زستانان ئارو ئەز) ف ١) آرد؛ ٢) پسوند مکان؛ ٣) آتش.

**ئارا:** ١) دۆستی و نێوان خۆشی؛ ٢) جێگەی ژینی هەمیشەیی؛ ٣) وجودو بوُن: (باسی تۆ دە **ئارادا** نیە) ف ١) دوستی؛ ٢) محل ثابت زندگی؛ ٣) وجود داشتن.

**ئاراز:** روبارێکە لە سنوُری ئێران و روسیا ف رود ارس.

**ئاراستـە:** روی شتێك بەرەو کەسێك کردن: (تیریکی **ئاراستـە** کرد، تۆمەتێکی ئاراستە کردم) ف چیزی را متوجه کسی کردن.

**ئاراق:** شیو و کوڵ، سابون یان ئەسپۆن و ئاوی حازرکراو بۆ جل‌شتن ف وسایل لباسشویی.

**ئارام:** بێ‌جوڵە، هێدی، هێمن، مەند، ئۆقرەگرتو ف آرام.

**ئاران:** ١) بنکـەی ژیانی زستـانەی کۆچەران، گەرمەسێر: (هەمو چوُنە هەواران، ئێمـە ماوین لە **ئاران**)؛ ٢) عەزیەت و ئێش ف ١) قشـلاق، مقابل ییلاق؛ ٢) درد و آزار.

**ئاراندن:** عەزیەت‌دان، ئێشاندن ف آزردن.

**ئاراو:** کەفاوی جارێك بۆ جل‌شوتن دەکار کراوی هێشتا بەکەڵك ماو ف پساب آب صابون.

**ئارایشت:** رازانەوە، خەمڵ، خۆ جوان کردن ف آرایش.

**ئارج:** دارخەیزەران کە دەکرێتە گۆچان و دیرەگە خێوەت ف چوب خیزران.

**ئارخاقك:** ١) چێشتی ئاردورۆن؛ ٢) کولێرەی بەشەکر و ئارد ف ١) آردە؛ ٢) کاچی.

**ئارختك:** مۆتەکە، شەوە، ئەوی لەخەودا دەت‌ترسێنێ و هاوارت بۆ ناکرێ ف کابوس.

**ئارخەیان:** خاترجەم، بێخەم، بێ‌ترس و دودڵی ف مطمئن.

**ئارد:** ئار، دەغڵی هاڕیاو ف آرد.

**ئارداوی:** ١) تۆزی آش گرتو؛ ٢) بریەتیە لە تۆمەت بەخۆ کردن. دەڵێن: *فلان دەهیچ‌دا نەبـوُ بەلام خۆی* ***ئارداوی*** *دەکـا* ف ١) گرد آسیاب گرفته؛ ٢) کنایە از خود را متهم کردن.

**ئارداویژ:** ١) ئەو شوێنـەی ئاردی لە لێواری بەرداشـەوە تێ دەڕژێ؛ ٢) لێوارە بەرداش لە گەڕاندا کە ئارد دەهاوێژێتە ناو قوڵکە؛ ٣) بریەتیە لە

دەراوی دەمی وێژەر: (فلانکەس **ئارداوێژی** دەمی خۆشە) ف ١) جای بیرون ریختن آرد از آسیاسنگ؛ ٢) لبهٔ آسیاسنگ؛ ٣) کنایه از طرز سخن گفتن.

**ئاردپێچ:** جۆرێك هەڵوایە لە ئاردو شەکر ف نوعی حلوای شکری.

**ئاردکێش:** بێڵۆکەی دارینی ئاشەوان کە ئاردی پێ لە قوڵکە دەردەدا ف پاروی آردکش آسیابان.

**ئاردماڵك:** ئەو کۆنە پەڕۆیەی ئاشەوان جێ ئاردی پێ دەماڵێ ف کهنهٔ پاك کردن تەماندهٔ آرد در آسیاب.

**ئاردن:** هاوردن، هێنان، ئانین ف آوردن.

**ئاردو:** ١) سوتمان، ئاگر کەوتنەوە؛ ٢) سوتەمەنی، ئاوردو ف ١) حریق؛ ٢) سوخت.

**ئاردو ڕۆن:** میوانی، چێشتی ئارد بەڕۆندا چاندن کە زۆرتر بۆ زەیستان درۆست دەکرێ ف کاچی.

**ئاردە:** تازە داهاتو، تازە بابەت، نۆهاتی ف نوآمده.

**ئاردە بارە:** بەشە ئاردێك کە ئاشێر بۆ هەربارێك کەمێکی بەخۆشی خۆی بە ئاشەوان دەبەخشێ ف بخشش آرد به آسیابان.

**ئاردەشان:** ئارداوێژ، ئەو شوێنەی بەرداش ئاردی لێوە دەخاتە قوڵکە ئاشەوە: (هەنی چێش واچون، چۆن مەکەرۆ چون / گەرد **ئاردەشان** ئاسیای گەردون) «مەولەوی» ف نگا: ئارداوێژ.

**ئاردەڵ:** نۆکەری بەردەستی خانی گەورە، باب نۆکەر، ڕاوێژکەری خان ف آردل.

**ئاردەلۆکە:** ١) وردە ئاردی سەر لێوی قوڵکە لە ئاشدا؛ ٢) بەفری زۆر وردو وشك کە دەبارێ ف ١) گرد آرد در آسیا؛ ٢) برف ریز و خشك.

**ئاردەلین:** تۆز ئاشی زۆر نەرم ف گرد آرد در آسیا.

**ئاردە مشار:** بڕەمشار، ئاردی هەڕە ف آرد اَرّه.

**ئاردەوا:** پەڵوڵە، چێشتی گزمۆلە هەویر و کوزەڵە ف آشی است با خمیر و ترتیزك آبی.

**ئاردەوارە:** ئاردەبارە ف بخشش از آرد به آسیابان.

**ئاردەی:** هاوردن، هانین، هێنان، ئانین ف آوردن.

**ئاردەینە:** داهێنروا، داهاتو، ژنوهاتی، نوچێبویی ف اختراع.

**ئاردی:** ئاردەوا، پەڵوڵە ف نگا: ئاردەوا.

**ئارزی:** ئاوات، ئارەزو، هێوی، دڵخواز ف آرزو.

**ئارزینگ:** چەنە، چەنەگە، چەناگە، چناکە ف زَنَخ، چانه.

**ئارژنگ:** دارێکی سورپێستە وەك بلاڵوك کە گۆچانی لێ درۆست دەکەن ف درختی است.

**ئارسم:** هەڵامەت، زوکام، پەسیو ف زُکام.

**ئارسمی:** هەڵامەت دار، پەسیو دار ف زُکامی.

**ئارفتە:** لە کار کەوتە، پەك کەوتە، کەڵك بڕاو، وێران، تێك تەپاو ف از کار اُفتاده.

**ئارگا:** ئاورگ، ئاگردان ف آتشگاه.

**ئارگۆن:** سورو گەش لە ڕەنگی ئاگر ف آتشگون.

**ئارمانج:** ١) نیشانە، کێلك؛ ٢) دۆز، مەبەست، نیاز لە ژیانا ف ١) هدف؛ ٢) مرام.

**ئارمانجانێ:** نیشانە داکردن، کێبەرکێ لە تفەنگو تیر هاوێژیدا، ئەزمۆنی ئەنگێوەیی ف هدفگیری.

**ئارموش:** ئاوریشم، هەورێشم، هەورەمیش، داوی لیکاوی کرمی ئاوریشم، تاڵی حەریر ف اَبریشم.

**ئارمویش:** ئارموش، هاوریشم ف اَبریشم.

**ئارمیش:** ئاوریشم، ئارموش ف اَبریشم.

**ئارنج:** مێخ زنجیر بۆ وڵاخ بەستنەوە، ئاخیە ف میخ طویله.

**ئارنگ:** دەردێکی ئاژاڵە، نەخۆشیەکە توشی حەیوان دەبێ ف مَرَض احشام.

**ئارو:** ١) خەیار، هارویێ؛ ٢) ئاڵو؛ ٣) پوك ف ١) خیار؛ ٢) لوزتین؛ ٣) لَثّه.

**ئارۆ:** ئیمڕۆ، ئەورۆ، ئەمڕۆ، ڕۆژی نێوان دوێنێو سبەینێ ف اِمروز.

**ئار وان:** ١) ئازوخەی ئارد لە ماڵدا؛ ٢) وشترێ سێ بەهاری دیبێ ف ١) آذوقهٔ آرد؛ ٢) شُتر سه ساله.

**ئاروانە:** وشتری چوار بەهار دیتو ف شُتر چهار ساله.

**ئاروت:** فرشتەیەك بوە هاواڵی ماروت لە چیرۆکاندا پێکەوەیان دەڵێن: (**ئاروت ماروت**) سەرەو نخون لە چاڵاوی بابلدا هەڵاوە سراونو تینویانەو ئاویان لەبەر چاوەو دەمیان ناگاتێ ف هاروت.

**ئارۆزیان:** هروژان، وروژان ف بەهیجان آمدن.

**ئاروشك:** پژمین، پشمین، پنژین ف عطسه.

**ئارۆك:** کفتە ساواری پانکەڵە کە لە گەنمە کوتاویش دەیکەن ف نوعی کوفتهٔ بلغور.

**ئارون و قارون:** بریەتیلە زۆر دەوڵەمەندو دارا ف کنایه از بسیار ثروتمند.

**ئاروێ:** هاروێ، خەیار ف خیار.

**ئارهان:** ژانو ئێشی ئەندامی سوتاو ف درد سوختگی.

**ئارهاندن:** چزاندن، داغ‌کردن بەئاگر ف داغ کردن.

**ئارەزو:** هێڤی، ئاوات، دڵخواز ف آرزو.

**ئارەزومەند:** بەتاسە، بەئاوات، بەعەزرەت ف آرزومند.

**ئارەفتە:** وێرانو لەکەڵك کەوتو ف خراب و از کار افتاده.

**ئارەق:** ١) تەڕایی لەش لە گەرمان یان لە شەرمان یان لە نوبەتێوە یان لەماندو بونەوە؛ ٢) شلی لە هەڵم تکاو، وەك ئارەقی سەرخۆشکەرو ئارەقی جاترەو هی تریش ف عَرَق.

**ئارە قاوی:** لەش بە ئارەق ف عَرَق کرده.

**ئارەقچن:** تەقیلە ف عَرَقچین.

**ئارەق دەردان:** تەڕی ئارەق لە ئەندام دەرکەوتن ف عرق بیرون دادن.

**ئارەق کردن:** ئارەق دەردان ف عَرَق کردن.

**ئارەقگیر:** پارچە لبادێکی تەنکە لەبن زینەوە دەخرێتە سەر پشتی وڵاخی سواری ف عرقگیر.

**ئارەقە:** ١) ئارەقی لەش؛ ٢) دارێك لەناو چینەی دیوار دەخرێ بۆ قایمتر بونی دیوار ف ١) عرق؛ ٢) چوب لایهٔ دیوار.

**ئارەی:** پڕ، تژی، دارماڵ ف پُر، مالامال.

**ئاری:** ١) نیشتەجێ، بەرانبەر بە کۆچەر؛ ٢) کۆمەگ، یاریدە، هاریکاری؛ ٣) لە ڕەسەنی قەومی ئاری، ئاریایی؛ ۴) خۆڵەمێش، مشکی، خۆڵەکەوە ف ١) مقیم؛ ٢) کمك؛ ٣) آریایی؛ ۴) خاکستر.

**ئاریْ:** بەڵێ، هەرێ ف آری.

**ئاریان:** ١) دڵ تێك چوُن و دڵ هەڵشێوان لە خواردنەوە؛ ٢) کوان و زیپکە لەلەش هاتن ف ١) حالت تهوع؛ ٢) ظاهرشدن جوش بر پوست.

**ئاریباری:** ١) هەڵوچەی سوُری پایزە؛ ٢) بەڵا ڵوك، ئاڵو باڵو ف ١) آلو سرخ؛ ٢) آلبالو.

**ئارێخ:** مێخ زنجیری تەویلە کە ولاغی پێ دەبەستنەوە ف میخ طَویله.

**ئاریختێ:** میراو، ئەوکەسەی کە ئاو دابەش کردنی بۆ ئاودێران بەدەستە ف میراب.

**ئارێز:** کەلێکی بەناوبانگە لەنێوان ڕێگای سنەو مریواندا ف گردنەای در راه سنندج مریوان.

**ئاریشە:** دژوار، چەتون، زەحمەت ف دشوار.

**ئاریکار:** یاریدەر، هاریکار، کەسێ کۆمەگ بە کەسێ دەکا ف یاری دهندە.

**ئاریکاری:** کۆمەگ، یاریدە، هاریکاری ف کُمك.

**ئاریلە:** پیاوی ژنانیلە، ژنەرەنگە، ئاڵی پیواز، یۆسف ئەفەندی: (نێرێکی ئاریلەیە، لاسای مێ دەکاتەوە) ف مرد زن‌نما.

**ئارێنج:** کوانی بن هەنگڵ، قونێر کە لە بن باخەڵ دەردەچێ ف دُمل زیر بَغل.

**ئارینۆك:** لەپە، لەتکە نۆك، نخۆشەر ف لَپّه.

**ئاز:** ١) زیپکەی شیری، ئەو چینچك و زیپکانەی لە ڕوی منالی شیرەخۆرە دێن؛ ٢) ساغ و ڕاست و بێ فڕوفێڵ ف ١) جوش صورت بچەهای شیرخوار؛ ٢) درست‌کار.

**ئازا:** ١) نەترس، ڕەشید، بەغیرەت؛ ٢) زو، بەپەلە: (**ئازا برۆ ئازا بگەیە**)؛ ٣) بەکاکڵ: (وەك گوێزی **ئازایە**)؛ ۴) ڕزگار، ئازاد: (گەردەنم ئازاکە، گەردنت **ئازابێ**)؛ ۵) ئەندامی لەش: (**هەمو ئازای لەشم ژان دەکا**) ف ١) شجاع؛ ٢) شتاب؛ ٣) با مغز؛ ۴) آزاد؛ ۵) اندام بدن.

**ئازاتی:** نەترسان، مێرخاسی، زیخی، گەڕناسی، ڕەشیدی ف شُجاعت.

**ئازاد:** ڕزگار، ڕاهی، سەربەست ف آزاد.

**ئازاد کردن:** ١) لە گیرۆدەیی ڕاهی کردن، لە زیندان بەردان؛ ٢) لێ خۆش‌بون، عافو کردن ف ١) و ٢) آزاد کردن.

**ئازادی:** ڕزگاری، سەربەستی ف آزادی.

**ئازادیخوا:** داواکاری سەربەستی، ڕزگاریخواز ف آزادیخواه.

**ئازادیخواز:** ئازادی‌خوا ف آزادیخواه.

**ئازار:** ١) ئێش و ژان؛ ٢) پەتاو درم، ئاهۆ؛ ٣) مانگی ئادار، مارس ف ١) آزار؛ ٢) مَرَض واگیردار؛ ٣) ماه مارس.

**ئازاردان:** عەزیەت دان، ئێش پێ گەیاندن ف آزردن.

**ئازاری سی:** دەردەباریکە، ئازاری سیل و دیق ف مرَض سِل.

**ئازاڵە:** سوختی زستانە، ئاوردو بۆ زمسان ف سوخت زمستانی.

**ئازانە:** ئازایانە، وەك پیاوانی نەترس و بەجەرگ ف شجاعانە.

**ئازایانە:** ئازانە ف نگاه: ئازانە.

**ئازایەتی:** نەترسان، گەڕناسی، غیرەت ف شُجاعت.

**ئازایی:** ١) ئازایەتی؛ ٢) ڕزگاری و ئازادی: (بە گەردن **ئازایی** دەت‌دەمێ) ف ١) شجاعت؛ ٢) آزادی.

**ئازپیش:** چێشت لێ‌نەر، ئاشپەز ف آشپز.

**ئازراندن:** عەزیەت‌دان، ئێشاندن ف آزردن.

**ئازری:** برینی بەچڵك و کێم و هەوا ف زخم چرکین.

**ئازگار:** تەواو، بەشوێن یەکدا بێ‌بڕانەوەو نێوان: (دوساڵی **ئازگار** لە زیندان بوم) ف بی‌کم‌وکاست، متوالی.

**ئازمودە:** تاقی‌کراوە، تەجرەبە کراو: (ماستی **ئازمودە** لە کەرەی نا **ئازمودە** چاترە) «مەسەل» ف آزمودە.

**ئازنگ:** خانوی بەسەر تەختەبەردی پانەوە دروس کراو ف خانەای کە بر تختەسنگ بنا شدە باشد.

**ئازوباز:** ئۆباڵ، تاوان و گوناح ف بزە، وبال.

**ئازوبەزە:** ئۆباڵ، ئازو باز، هۆباڵ: (**ئازوبەزەت** وە ملم من ئەم کارەم نەکردوە) ف بزە، وبال.

**ئازوخە:** بژیوی پێداویست لە ماڵدا، تفاق ف آذوقە.

**ئازوخەدا خستن:** بژیوی زستانە دابین کردن، تفاق کۆم کردن ف آذوقە اندوختن.

**ئازوقە:** ئازوخە ف آذوقە.

**ئازەب:** جحێڵی بێ‌ژن یان بێ‌مێرد ف عَزب.

**ئازەبەت:** زیپکەی دەم و چاوی تازە لاوان، عازەوی، عازەبی ف جوش عزبی.

**ئازەپ:** کۆیلەی بەدراو کڕدراو، بەندەی زەرخری ف بردە زر خَرید.

**ئازەخ:** بالوُکە، بالوُك، زیپکە ئاساییەکی ڕەقی بێ‌ژانە لەدەست و پل دێت ف زگیل.

**ئازەر:** نۆهەمین مانگی ئێرانی بەرانبەر بە سەرماوەز ف آذرماه.

**ئازەنتی:** ڕاوە، مانالێ دانەوە، شی کردنەوەی نوسراوێك بەنوسراوێك ف شرح و تفسیر.

**ئازیز:** خۆشەویست، بەڕێز: (**ئازیز** دیارەن وادەی لوامەن / ئەلوەدای ئاخر ئەوە ئامامەن) «مەولەوی» ف عزیز.

**ئازیز مەردە:** ئازیەت بار، خۆشەویس مردو ف عَزادار.

**ئازیزە:** ناوی هەوایەکی گۆرانی کۆنی کوردە ف از آهنگهای قدیمی کردی.

**ئازیەت:** تازیە، خەم داگرتن بۆ تازە مردگ، ماتەم ف عزا، ماتم.

**ئازیەت‌بار:** خەمباری خۆشەویست مردو، ماتەمین ف ماتم‌زدە.

**ئازیەتی:** ئازیەت باری ف سوکواری.

**ئاژ:** بەرانبەری لوس و لێك، زبر و زوُر، نەپوڕ ف ضد صاف، خشن.

**ئاژار:** بەهرەو دەرامەتی زەوی، حاسڵاتی زەوی و زار ف مَحصول زَمین.

**ئاژاژك:** باوێشك، لەبەر خەو دەم داچەقاندن ف خمیازە.

**ئاژاشکە:** ١) باوێشك؛ ٢) مچورك، تەزو، موچرك ف ١) خمیازە؛ ٢)

مورمورشدن بدن.

**ئاژاڵ**: ١) ياتاڵ، ولَسات، گاو گوڵ و مەڕو مالات؛ ٢) پڕو پوش و چيلكەو چاڵ [ف] ١) دام، احشام؛ ٢) علف و خس و خاشاك.

**ئاژان**: پۆليس، قوڵچى، شاگرد داروغە [ف] آژان، پاسبان.

**ئاژاوڵە**: پشێوى و كەس لەكەس، ئاژاولە [ف] آشوب، بلبشو.

**ئاژاولە**: ئاژاوڵە [ف] آشوب.

**ئاژاوە**: ئاژاوڵە [ف] آشوب.

**ئاژاوەچى**: كەتن گێڕ، مايە فتنە، سەرە سودرە، شەڕهەڵايسێن، شەڕهەڵ خڕێن [ف] آشوبگر.

**ئاژاوە نانــەوە**: كەتن گێڕان، فتنــە نانــەوە، شەڕ هەڵخڕانــدن [ف] آشوبگرى و فتنەانگيزى.

**ئاژدا**: باپيران، ئەجداد: (هەركەس بێگانە بەرستە نەحلەت لە ئاژداشى بێ) [ف] نياكان.

**ئاژداد**: ئاژدا [ف] نياكان.

**ئاژر**: ڕك، ڕق، تۆڕەيى، قين [ف] خشم.

**ئاژرى**: تۆڕە، ڕق هەستاو، بەڕك [ف] خشمناك.

**ئاژن**: ١) زۆر تێ چەقـاندن، بە دەورى يەكا تێوە كردن: (هەمو گيانيان دەرزى ئاژن كرد)؛ ٢) كوڵينەوەى ددان بۆ خاوێن كردنەوەى لە وردە گۆشت و... [ف] ١) خلانيدن؛ ٢) دندان خِلال كردن.

**ئاژنى**: مەلە، مەلەوانى، سۆبايى [ف] شنا

**ئاژنين**: ١) كوڵينــەوەو تێوە كردنى نوك تيژ بە شتێكدا: (خەريكى ددان ئاژنينــە)؛ ٢) داخستن: (دەرگاكە باژنە)؛ ٣) داكەندن: (كراسەكەم ئاژنى، دامكەنـد)؛ ٤) زبـركردن، زرب كردن، كونجركونجر كردنى بەرداش [ف] ١) خلانيدن؛ ٢) بستن؛ ٣) درآوردن؛ ٤) زِبركردنِ آسياسنگ.

**ئاژۆ**: ١) لێخوڕ، كەسێ كە بارەبەر لێ دەخوڕێ: (باژۆ سوارۆ ئەسپێ خۆ باژۆ)؛ ٢) شوێن هەڵگرتن، شوێن گێڕى؛ ٣) لك‌لێ بونەوەى ريشە [ف] ١) رانندە؛ ٢) رَديابى؛ ٣) ريشە دوانيدن.

**ئاژۆتن**: لێخوڕين: (لە ترومبيل ئاژۆتن دا زۆر بەكارە) [ف] رانندگى.

**ئاژۆتنەسەر**: پەلامار بۆ بردن، هەڵكوتانە سەر [ف] هجوم، يورش.

**ئاژۆدان**: بۆ شەو لەوەڕ بردنى مێگەل [ف] بردن گلّه در شب براى چرا.

**ئاژەڵ**: ئاژاڵ، مالات، ولَسات [ف] اَحشام.

**ئاژەڵدارى**: حەيوان ڕاگرتن، مالات بەخێو كردن، دەوڵەت‌دارى [ف] دامدارى.

**ئاژين**: زبر بون، زبر وەك زبرى بڕ بەندو بەرداش [ف] زبر بودن.

**ئاژينــە**: چەقـەنـەى ئاش، چەقچـەق، چەقچـەقـە، چەقچـەقوك: ٢) چەكوشى بيرازكردن كە سەرەكەى ددانەى هەيە [ف] ١) لكلكۀ آسياب، كُلندۀ آسياب؛ ٢) آژينە.

**ئاس**: ١) قاقوم: *جانەوەرێكە توك سپى لەتيرەى بانبانك و سمۆرە، كە كەوڵى زۆر بەنرخە*؛ ٢) پەڕێكە لە پەنجاودو پەڕى قومار؛ ٣) كەنەفت و مانــدو، *بەم مانـايە بە تەنيا ناگوتـرێ وە لەگەڵ پەلاس‌دا دێ*: (بـە سوێندانەوە **ئاس و پەلاس دەبێتەوە**)؛ ٤) ڕوت و ڕەجاڵ: (كابرا ئاس و پەلاسـە، هيچ شك نابـات) [ف] ١) قاقم؛ ٢) تكخال ورق بازى؛ ٣) خستە؛ ٤) پابرهنە.

**ئاسا**: وەكو: (منيش خۆت **ئاسا** ئەم‌كارەم كرد) [ف] آسا.

**ئاسار**: شوێنەوارى، بنەڕەت [ف] آثار، پايەو اساس.

**ئاسان**: هاسان، سانايى [ف] آسان.

**ئاســانە**: ١) سەردەرانە، ژێردەرانە؛ ٢) بريەتيەلە بەرماڵى گەورە ماڵان: (من شەوێ ناڵەم جۆش ئاوەردەبۆ / سەگى **ئاسانەت** بێدار كەردەبۆ) «مەولەوى» [ف] ١) و ٢) آستانە.

**ئاساو**: ئاشى ئاو، ئاسياو، ئێشى دەخڵ هاڕين [ف] آسياب.

**ئاسايشت**: ئاسودەيى، ئيسراحەت، بێ‌خەمى [ف] آسايش.

**ئاسايى**: ١) ئاسا: (پياوێ خرەت **ئاسايى** باش بو)؛ ٢) عادەتى، بەرانبەر بە ياســاى كۆمەڵايەتى: (شەڕو شوڕ بارى **ئاسايى** تێك داوە) [ف] ١) مانند؛ ٢) معمولى.

**ئاسپايى**: هێديكا، بەسەبر، هێواش، لەسەر خۆ [ف] يواش.

**ئاست**: ١) زەحمەت، چەتۆن؛ ٢) جێگا، شوێن: (لەو **ئاستە** تۆشى‌بوم)؛ ٣) بەرانبـەر، ڕوبـەڕو: (لـە **ئاستت** چاوم هەڵنايە) [ف] ١) دشوار؛ ٢) مكان؛ ٣) مقابل، روبرو.

**ئاستاش‌جيا**: بەجێمى هێشت [ف] مرا بجا گذاشت.

**ئاستش**: هێشتى، ڕيگەى‌دا، ئلى [ف] اجازە داد.

**ئاستش‌جيا**: بەجێ هێشت [ف] جاگذاشت.

**ئاستن**: هێشتن، دەس‌لێ هەڵگرتن [ف] هشتن.

**ئاستون**: بەر دەرگا، بەرماڵ [ف] جلو در.

**ئاستەبو**: بەجێ هێشتنى ئاسەوار [ف] اثر بجاگذاشتن.

**ئاستەڕ**: ئاسەڕ، بەر، بەرە كەوا، بەرەلێفە: (كەواى قوتنى **ئاستەڕى** جاوە) «مەسەل» [ف] آستر.

**ئاستەم**: ١) كەموكە، بەحاڵ، كەمترين ئەندازە: (بە**ئاستەم** دەستم لێ‌دا هاوارى كرد، دەستم بە **ئاستــەمێك** ڕوشاوە)؛ ٢) دژوارو هەڵەموت: (تەرەغە كێوێكى **ئاستەمە**) [ف] ١) اندك؛ ٢) سخت و صعب‌العبور.

**ئاستەنگ**: جێگەى سەخت و هەڵەموت [ف] كوە و راە سخت.

**ئاستەى**: هێشتن، ئاسەى، تلين [ف] اجازە دادن.

**ئاسرم**: هەلامەت، پەسيو، زوكام [ف] زُكام.

**ئاسرمە**: باريكە چەرمێكە لە كورتاندا كە دەكەوێتە سەر كلكى بارەبەر [ف] نوار چرمى پالان كە بر دم حيوان باربر افتد.

**ئاسك**: مامز، كەژاڵ، خەزاڵ، مامبز [ف] آهو.

**ئاسكۆل**: كارمامز، بيچوە ئاسك [ف] بچّە آهو.

**ئاسمــــان**: حەوا، عاسمــــان، بەرزايێ كە ئەستێرەو مانــگ و ڕۆژى لێوە دەبيندرێن، ئەزمان، ئەزمێن [ف] آسمان.

**ئاسمانە**: ١) ميچى بەرز، ٢) مەلاشوى زار، ئاسمانەى دەم [ف] ١) سَقفِ بُلند؛ ٢) سق.

**ئاسمانى**: شين بەڕەنگى ئاسمان، عابى [ف] آبى‌رنگ.

**ئاسمين**: ياسەمەنە، گوڵێكى داروكەى سپى و بۆن خۆشە [ف] ياسمن.

**ئاسن**: ئێسن، هەسن [ف] آهن.

**ئاسنجاو:** قاپ‌و قاچاغی مسین، دەفر و بەرۆشی لەمس چێکری [ف] ظروف فلزی و بیشتر مسی.

**ئاسندڕك:** دڕکە ئاسنینە، تێلی وارشی دڕك‌دار [ف] سیم خاردار.

**ئاسنگەر:** وەستای ئامرازی ئاسن، وەستا خاڵە [ف] آهنگر.

**ئاسنەواڵە:** لەکارکەوتەو لەت‌و پەتی ئامرازی ئاسن، قوڕازەی ئاسنی [ف] خُرده فلز، سقط.

**ئاسنی:** ئاسنین [ف] آهنین.

**ئاسنین:** ١) دروس کراو لە ئاسن؛ ٢) قایم‌و بەهێز وەك ئاسن [ف] ١) و ٢) آهنین.

**ئاسۆ:** ١) کەنارەی ئاسمان، قەراغی ئاسمان؛ ٢) تارمایی، ڕەشایی لەدور [ف] ١) اُفُق؛ ٢) سایه‌ای در تاریکی.

**ئاسودە:** ڕەحەت، بێ‌خەم، بەئیسراحەت [ف] آسوده.

**ئاسودەیی:** ئیسراحەت، ڕەحەتی [ف] آسودگی.

**ئاسۆگ:** کەنارەی عاسمان، ئاسۆ [ف] اُفُق.

**ئاسەڕ:** ئاستەڕ [ف] آستر.

**ئاسەوار:** ١) شوێنەواری کەون؛ ٢) پاش ماوەی ڕەچەڵەك: (هەی ئاسەوارتان ببڕێ) [ف] ١) آثار؛ ٢) نسل، نژاد.

**ئاسەی:** ئاستەی، هێشتن، تلین [ف] اجازه دادن.

**ئاسێ:** ١) سەخت‌و دژوار: (مانای ئەو وشەیە زۆر **ئاسێ**یە، نایزانم)؛ ٢) هەڵە موت‌و هەزار بەهەزار: (چیایەکە گەلەکی **ئاسێ**یە) [ف] ١) سخت و مُشکل؛ ٢) کوه مُرتفع.

**ئاسیا:** بەشێکی گەورە لە چوار فوڕنەی دنیایە، پارچە وشکانی هەرە زل لە جیهانا [ف] قارّهٔ آسیا.

**ئاسیاو:** ئاشی ئاو، ئاساو [ف] آسیاب.

**ئاسیاوان:** ئاشەوان [ف] آسیابان.

**ئاسیدە:** هەڵوایەکە لە ئاردو ڕۆن‌و دۆشاو، هەڵوای بەدۆشاوی [ف] حلوا.

**ئاسێرە:** ئەستێرە [ف] ستاره.

**ئاسین:** ١) قوڵـە کراس، سوڕانی، قوڵە کەوا، ئەنگوچك؛ ٢) سورەتی یاسین: (ئاسینەکی سەر نەخۆش بخوینە) [ف] ١) آستین: ٢) سورهٔ یاسین.

**ئاسیو:** زیان، زەرەر، عەزیەت، بەڵا، ئازار [ف] آسیب.

**ئاسێه:** ١) ئاسێ، سەخت‌و دژوار؛ ٢) داروکەی سنجوەتاڵە کە ئاگری زۆر بەتینە [ف] ١) سخت‌و دشوار؛ ٢) هیزم سنجد تلخ.

**ئاش:** ١) ئاسیاو؛ ٢) ئاشت‌و نیوان خۆش؛ ٣) چێشتی ماس‌و گیا، دۆ کولیو، دۆکلیو؛ ٤) شۆی پارچەو یاخەکراس، دەق [ف] ١) آسیاب؛ ٢) آشت؛ ٣) آش ماست؛ ٤) آهار.

**ئاشاخە:** ١) میوەی ڕزیو، قرپۆك؛ ٢) حەیوانی بێ‌برەو لە جەڵەبدا؛ ٣) هەرشتی ئالەبارو بێکارە [ف] ١) میوهٔ گندیده؛ ٢) حیوان کم‌بها؛ ٣) بُنجُل.

**ئاشاغە:** ئاشاخە [ف] نگا: ئاشاخه.

**ئاشانە:** دەیەکی مزاش کەبەشی خاوەن ئاشەو ئاشەوان دەیداتێ [ف] مُزد آسیا.

**ئاش بەتاڵ:** دەس لەکار کێشان [ف] دست از کار کشیدن.

**ئاشپەز:** شیوکەر، چێشت کەر، چێشت لێنەر [ف] آشپز.

**ئاشپەزخانە:** مۆبەق، کارخانە، متبەخ، جێگەی شیولێنان [ف] آشپزخانه، مَطْبَخْ.

**ئاشپەزی:** شیولێنان، چێشت کەری [ف] آشپزی.

**ئاشت:** نیوان‌خۆش، دۆست، بێ‌شەڕو داوا [ف] آشت.

**ئاشتبونـەوە:** دەی نیوان ناخۆشی، یەك‌هاتن‌و بونە دۆست، مەسلەحەت کردن [ف] صُلح کردن.

**ئاشتەبا:** شت [ف] موجودی.

**ئاشتی:** هێمنایەتی، نیوان‌خۆشی [ف] آشتی.

**ئاشتیخواز:** هێمنایی خواز، ئەوەی دژی شەڕو هەرابێت [ف] صُلح‌طَلَب.

**ئاشتێنی:** نیوان خۆشی، ئاشتی [ف] آشتی.

**ئاشچی:** ئاشپەز، شیوکەر [ف] آشپز.

**ئاشخانە:** چێشتخانە، جێگەی نان‌و چێشت لێ کڕین [ف] رستوران.

**ئاشرمە:** ئاسرمە [ف] نگاه: ئاسرمه.

**ئاشڤان:** ئاشەوان، ئاسیاوان [ف] آسیابان.

**ئاشق:** دڵدار، ئەویندار، بەندەوار [ف] عاشق.

**ئاشقە:** ئاشق: (ئاشقەو ماشقە) بۆماری نێرومێ دەگوترێ [ف] عاشق.

**ئاشك:** ١) ورگ، مەدە، عور؛ ٢) هێز، وزە، توانایی، تاقەت؛ ٣) ئەویندار [ف] ١) شکمبه؛ ٢) توان؛ ٣) عاشق.

**ئاشکرا:** خویا، دیار، دیاری، بەرچاو [ف] آشکار.

**ئاشکرابون:** ١) دیاری‌دان، خویابون؛ ٢) دەرکەوتنی نهێنی، دیاردانی وەشارتی [ف] ١) آشکارشدن؛ ٢) فاش شدن.

**ئاشکـراکـردن:** نهێنی دەرخستن، پەنـامـەکی خستنـەرو: (ڕازەکـەم ئاشکرابو). [ف] فاش کردن.

**ئاشکرایی:** خویایی، دیاردە، دژی نهێنی [ف] آشکارا.

**ئاشگێڕ:** ئەندازەئاوێکی ئاشی پێ دەگەڕێ [ف] آب آسیاب گردان.

**ئاشمای:** ڤەخوارن، خواردنەوە، فڕکردن [ف] آشامیدن.

**ئاشنا:** ١) ناس، ناسکری؛ ٢) دۆست‌و یار: (دەگەڵ فلاندا زۆر **ئاشناین**) [ف] ١) و ٢) آشنا.

**ئاشنایەتی:** نیوان خۆشی، ناسیاوی [ف] آشنایی.

**ئاشو:** کێم‌و زۆخی برین [ف] ریم‌و چرك زخم.

**ئاشۆ:** ١) وچان، پشودان، تۆزێك وێستان بۆ ئیسراحەت کردن؛ ٢) کێم‌و زۆخی برین؛ ٣) پەشێوی‌و ئاژاوە [ف] ١) وقفهٔ کوتاه؛ ٢) چرك زخم؛ ٣) آشوب‌و بلوا.

**ئاشۆپاشۆ:** ١) قسەی شڕو بێ‌تام؛ ٢) خەو دیتنی پەرێشان‌و بێ سەروبن [ف] ١) یاوه؛ ٢) خواب و رؤیای آشفته.

**ئاشۆت:** ڕنی، ڕنو، کڵێڵە، هەرەس، بەفری کۆمەڵ لە بازنەوە بەچیاوە [ف] بَهمَن.

**ئاشوژن:** گشتەکی جەواڵ درون [ف] رشتهٔ جَوال‌دوزی.

**ئاش‌وەستا:** وەستای ئاش چاك کردن [ف] استادکار آسیاب.

**ئاشـە بەتـەنـدورە:** گاڵتـەی زارۆکـان، دەستـەی تێکـەوتـو بەپێوە

سەربەسەری یەکەوە دەنێن سەرکەو تو دەچنە کۆڵیان، گەمەی کەری سوری پشت درێژ ف نوعی بازی کودکان.

**ئاشـەتـەنـدورە:** ١) گێژاو، سوڕی ئاوی گۆمی قوڵ؛ ٢) گەمەی ئاش بەتـەنـدوُرە؛ ٣) ئاشێکی دوڵـەکەی بەقسڵو بەرد ئەکەن تا بە ئاوی کەمیش بگەڕێ ف ١) گرداب؛ ٢) نوعی بازی؛ ٣) نوعی آسیاب.

**ئاشەقو لانێ:** گاڵتەیەکی منالانەیە ف نوعی بازی کودکان.

**ئاشـــەگـــوێرێژ:** ناوی شتێکی نەبـوی خەیاڵیە وەك درنـج منـاڵی پێ دەترسێنن ف از موجودات خیالی، لولو.

**ئاشەوان:** ئاسیاوان، ئاشڤان ف آسیابان.

**ئاشێ:** دەردو کوێرەوەری ف زحمت و دردسر.

**ئاشێر:** کەسێ کە باراش دەبا بۆ ئاش ف مراجع آسیاب.

**ئاشێف:** ئاشێڤ ف تَکمیش.

**ئاشێڤ:** بنکۆڵ کردنی سەوزەواتێ بۆ بەهێزبونی ف تَکمیش.

**ئاشێگە:** زەوی سەخت و ڕەقەن ف زمین سخت.

**ئاشێو:** ١) دەردو بەلاو بەسـەرهاتی خراپ؛ ٢) پەشێوی و ئاژاوە ف ١) مصیبت؛ ٢) آشوب.

**ئاغا:** لەقەمە بۆ پیاوی زل، بۆ خاون گوند، لە ئێراندا وەپێش ناوی هەمو پیاوێك ئەکەوێ، کابرا ف آقا.

**ئاغابانو:** پارچەیەکە بۆ لەسەرنانی پیاوان بەکاردێ، ئاخەبانو ف آغابانو.

**ئاغاتی:** گەورەیی، خاون موڵکی، بەڕێوە بردنی ڕەعیەتان ف آقایی.

**ئاغاژن:** ژنی ئاغا، ناوە کە دوای ئەو لەقەمە دەکەوێ وەك: (**ئاغاژنە فات**) ف همسر ارباب.

**ئاغایەتی:** ئاغاتی، مەزنایەتی، گەورەیی ف آقایی، سروری.

**ئاغزوُنە:** ئاڵقەی ددانەداری کانزا کە زمانەی تێدایەو بۆ داخستنی قایشی پشت و کەوش و بەرەزین و ... بەکار دەهێنرێ ف سگك.

**ئاغـزە:** قونچکـە سیغـار، کاغـەزێکـە دەیپێچن و دەیخـەنە بنی قامیشە سیغارەوە، بنکی جغارە ف فیلتر سیگار.

**ئاغڵەب:** زوربە، زۆرجاران ف اَغْلَب.

**ئاغڵەویك:** ئاخڵەویك، تاوە ف تابە.

**ئاغە:** ئاغا ف آقا.

**ئاغەبانو:** ئاغابانو ف آغابانو.

**ئاغەبرا:** بەبرای گەورە دەڵێن ف داداش.

**ئاغەجەواش:** گیایەکی بۆن خۆشە کەلەدۆ کولێوی دەکەن ف از گیاهان معطّر.

**ئاغەڵ:** غەڵ، جێی داکرتنی مەڕو بزن لە دەمی سەرمادا، هۆڵ ف آغُل.

**ئافات:** دەردو ئازار، بەلاو پەتا: (تاقانە یەتیمی خەڵەفی ئاخری نیسان / بۆ خۆش بی سەدەف بو بە فیدات دور بی لە **ئافات**) «نالی» ف آفات.

**ئافتـا:** هاوتـا، ئامتـا، هامتـا، هەمبـەر: (ئەگەر چاوی خۆم بەیایە زینێ هەڵدێنایە / وەهام دەدی **ئافتای** کاکە مەمێ جوانە) «بەیتی مەم و زین» ف همتا.

**ئافتاو:** خۆر، ڕۆژی بەرانبەری مانگی عاسمان ف خورشید.

**ئافتـاو گەردان:** پێشەسەرێکە دروێنەوان لە توێڵیان دەبەستن تا تاو لە چاویان نەدات ف سایەبانِ کلاه دِرَوگَران.

**ئافتاوە:** مسینە، لولێنە، مەعدەنی، مسینك ف آفتابە.

**ئافڕ:** ئاخوڕ، جێ خۆراکی ئاژاڵ کە لە قوڕ هەڵبەستراوە ف آخور.

**ئافران:** دروس بون، هاتنەدی، چێ بون ف خلق شدن.

**ئافراندن:** خوڵقاندن، دروس کردن، بەدی هێنان: (خودێ هەردو ئەزمێن **ئافراند**) ف آفریدن.

**ئافرەت:** برێتیە لە ژن، مێوینەی مرۆ، عافرەت، زەعیفە ف کنایە از زن.

**ئافشوُژن:** گشتەکەبەنی تێڕ و جەوالدروُن ف نخ جوالدوزی.

**ئافور:** گاکێوی ف گوزن.

**ئافەت:** ئافات ف آفت.

**ئافەریدە:** دروس کراو، خوڵقاو، رسکاو، مەخلوق، وەدیهاتو، دا هێنراو ف آفریدە.

**ئافەرەم:** ئافەریم ف آفرین.

**ئافەریم:** کارێ باشت کرد، دەس خۆش، باریکەڵلا ف آفرین.

**ئافەرین:** ئافەریم ف آفرین.

**ئاڤ:** ئاو ف آب.

**ئاڤا:** ئاوەدان، ئاوا، بەرانبەر بە وێران ف آباد.

**ئاڤاتەزی:** ئاوی سارد ف آبِ خنك.

**ئاڤابەرف:** بەفراو، سەهۆڵاو ف برف آب.

**ئاڤار:** کەوڵ و پێستەی ئاژاڵ بەرلە دەباغ ف پوست دباغی نشدە.

**ئاڤاڕو:** ئاوڕو، ئابڕو ف آبرو.

**ئاڤاڕێ:** لەرێ دەرچوگ، گومڕا، لەرێ لادەر ف گمراه.

**ئاڤاهی:** ١) گوند، دێ، ئاوایی، ئاوەدانی؛ ٢) کۆشك، خانو بەرە، خانو ف ١) آبادی؛ ٢) خانە.

**ئاڤ پەنـگ:** ئەو قولکـەی یان ئەو بەردە قوُڵەی کە ئاوی بارانی تێدا رادەوەستێ ف جای جمع شدن آبِ باران.

**ئاڤ پیڤاز:** پیوازاو، پیازاو، چێشتی ڕۆن و پیوازو ئاو ف سوپ پیاز.

**ئاڤخێز:** ئاوێ کە بە مەندی و لەسەرخۆ بڕوا، دژی خوڕ ف آبخَیز.

**ئاڤدانك:** دەفری ئاو ف ظرفِ آب.

**ئاڤـــدونـــگ:** ١) شۆربـــای بێ ڕۆن و ناخـۆش؛ ٢) ئاڤـرێژ، جێ مێز، ئاودەسخانە ف ١) سوپ بدون چربی؛ ٢) مُستراح.

**ئاڤـدەست:** ١) ئابخـانە، ئاودەست، ئاودەستخانە؛ ٢) دەسپاك، ئەمین، جێ باوەڕ ف ١) مُستراح؛ ٢) شخصِ امین و درستکار.

**ئاڤدەڤ:** قومقومە، مەتارەی ئاو ف قمقمە.

**ئاڤدەل:** نێرە پوڕ ف دُرّاج نَر.

**ئاڤدین:** تۆڵە کردنەوە، لەحەق هاتن ف تلافی.

**ئاڤرێژ:** جێ مێز، ئاودەسخانە ف مستراح.

**ئاڤزە لیێلك:** نەخۆشی ئاوبەند، دەردی ئیسقایی ف بیماری استسقا.

**ئاڤزەمکی:** درەنگ ڕەسیو، ولامێك درەنگ بگا، دیاریەك یا ناردراوێك دێر بگات ف دیر رس.

**ئاڤزێم:** کانی و سەرچاوەیەك کە هاوینان وشك بکا، کوێرە کانی ف چشمۀ زایندە.

**ئاڤزین:** بڵندایی‌و گێژی نێرینەی ئاو[ف] کوهۀ آب.
**ئاڤژەن:** ١) مەلەوان، سۆبایی کەر؛ ٢) سەوڵی بەلەم لێ خوڕین، سەوڵی کەڵەکە وانی[ف] ١) شناگر؛ ٢) پاروی قایقرانی.
**ئاڤژەنی:** مەلەوانی، سۆبایی[ف] شناگری.
**ئاڤس:** ئاوس، زك‌پڕ، تۆل لە زگدا[ف] آبستن.
**ئاڤسین:** ١) زك پڕ بوُن؛ ٢) ئەستوُربوُن‌و هەڵامسان[ف] ١) آبستن شدن؛ ٢) آماسیدن.
**ئاڤشۆ:** چڵکاو، ئاوی شت‌پێ شۆراو[ف] پس‌آب.
**ئاڤشیز:** ئاوی لیخن‌و پڕ لم‌و لیتە[ف] آب گِل‌آلود.
**ئاڤشیلە:** ئاوی قۆرە، گوشراوی بەرسیلە[ف] آبغورە.
**ئاڤکینە:** تونگەی لولەداری لەشوشە[ف] تُنگ شیشەای.
**ئاڤگیر:** قۆرت‌و قوڵکەی کە ئاوی باران ڕادەگرێ[ف] جای جمع‌شدنِ آبِ باران.
**ئاڤڕێ:** لادەر لە ڕێگە[ف] مُنحرف.
**ئاڤەرێس:** ئاوریشمی خاو، هاورێشمی هێشتا نەڕێسراو[ف] ابریشمِ خام.
**ئاڤی:** ١) بەراو، ئاوی، بەرانبەری دێمی؛ ٢) شەونم؛ ٣) هەڵوەداو ئاوارە؛ ٤) جانەوەری ئاوی[ف] ١) آبی، مقابل دیَمی؛ ٢) شبنم؛ ٣) آوارە؛ ٤) آبزی.
**ئاڤیاری:** بەیارمەتی، لەسایەی[ف] کمك، یاری.
**ئاڤیتن:** هاویشتن، توڕدان، فڕێدان[ف] پَرت کَردن.
**ئاڤێر:** وچانی تەڵاقدراو یا مێرد مردو، عیددە[ف] عدّۀ زن.
**ئاڤێژ:** فڕێدەر، توڕدەر، هاوێژەر، دەبێتە پاشگر[ف] پَرت کُنندە.
**ئاقار:** ١) شوێن‌و جێگە؛ ٢) دەورو بەر؛ ٣) مەڵبەندو ناوچە: (ماڵمان لەو ئاقارانە بو)[ف] ١) جای؛ ٢) پیرامون؛ ٣) منطقە.
**ئاقڵ:** بەئاوەز، زانا، ژیر، عاقڵ، وریاو فامیدە[ف] عاقل.
**ئاقۆ:** جۆرێ کۆتر[ف] نوعی کبوتر.
**ئاقوت:** یاقوت، بەردێکی بەنرخەو غاڵبەی بەڕەنگی سوری گەشە[ف] یاقوت.
**ئاقوُیت:** ئاقوت[ف] یاقوت.
**ئاقیبەت:** عاقیبەت، دوماهی[ف] سرانجام.
**ئاقید:** دۆشاوی خەست، دمسی تیر[ف] شیرۀ غلیظ.
**ئاقیدە:** بیروبڕوا، دۆز، عاقیدە[ف] عقیدە.
**ئاقیق:** گەوهەرێکە بەزۆر ڕەنگان دەبێ، یاقیق[ف] عقیق.
**ئاك:** پاشگرێکە وشەی ئامرازو هۆ دەدا وەك: پۆشاك، خۆراك کە واتای خواردەمەنی، پۆشیەنی دەدا[ف] پسوندی است.
**ئاکابر:** پیاوە گەورەکان، مرۆیێت مەزن[ف] بزرگان.
**ئاکابرانە:** ئاکاری پیاوانە، شیاوی گەورە پیاوان[ف] شایستۀ بزرگان.
**ئاکار:** خو، ڕەوشت، کردەوە، ئەخلاق[ف] کردارو اخلاق.
**ئاکام:** ١) دوماهی، دوایی، پاشینە؛ ٢) کاتی مەرگ، هەنجەڵ، ئەجەل: (زیندە بەئاکامە)[ف] ١) انجام؛ ٢) اَجَل.
**ئاکنجی:** نیشتەجێ لەکۆنەوە، ڕەعیەتی قەدیمی[ف] مُقیم از قدیم.
**ئاگا:** ١) خەبەر، های: (**ئاگات** لەو کارە هەیە؟)؛ ٢) زاناو فامیدە؛ ٣) ئاگا، نەخەوتو، بێدار: (فڵان خەوتوە یان **ئاگایە**)؛ ٤) قەیران‌و تیژبونی نەخۆشی، بوحران[ف] ١) خبر؛ ٢) آگاه؛ ٣) بیدار؛ ٤) بحران مرض.
**ئاگابونەوە:** لەخەو هەستان، لە بێهۆشی وشیار بونەوە[ف] بیدارشدن.
**ئاگادار:** ١) های‌لێ، خەبەردار؛ ٢) پارێزگار: (**ئاگادارت** خودابێ)[ف] ١) آگاه؛ ٢؛ نگهدار و حافظ.
**ئاگر:** ئاور، ئێگر، ئاهر، ئایەر، ئاتەر[ف] آتش.
**ئاگرباران:** ١) برێتیە لە شەڕە تفەنگی زۆر؛ ٢) برێتیە لە گەرمای زۆر و بەتەوژم[ف] ١) کنایە از تیراندازی شدید با تفنگ؛ ٢) گرمای بسیار شدید.
**ئاگربازی:** فیشە کەشێتە هەڵدان‌و ئاگر پژاندن لە جێژندا[ف] آتش‌بازی.
**ئاگربڕ:** دامرکاندنی سوتمان، تەمراندنی شەوات[ف] فرونشاندن آتش، اطفای حریق.
**ئاگر بردن:** سازو ئامادەبون بۆ زو سوتان[ف] قابل اشتعال بودن.
**ئاگر بەر:** ئامادە بۆسوتان: (پوشوە کەت زۆرباش‌و **ئاگربەرە**)[ف] آمادە برای سوختن.
**ئاگر بەربون:** سوتمان، شەوات، ئاور بەربونەوە[ف] حریق.
**ئاگر بەردانەوە:** ئاور دەوڵات بەردان، سوتمان نانەوە[ف] آتش‌افروزی و ایجاد حریق.
**ئاگر پارە:** هارو هاج، وریاو زیت، ئاتەشپارە[ف] آتشپارە.
**ئاگر پژێن:** کێوێ کە سەرەکەی ئاگر دەپژێنێ، ئاگری[ف] آتشفشان.
**ئاگر پەرست:** گاور، مەجوسی، پەیڕەوی دینی زەردەشت[ف] آتش‌پَرست.
**ئاگرتێ بەربوُن:** ئاگر گرتن، گڕگرتن[ف] مُشتعِل شدن.
**ئاگرخانە:** کۆرەی ئاسنگەر[ف] کورۀ آهنگر.
**ئاگر خۆرە:** وشترمر، جۆرە مریشکێکی زۆر زەبەلاحە، پێ‌رەوەو نافڕێ دەڵێن ئاگریش دەخوا[ف] شُترمُرغ.
**ئاگر خۆش کردن:** ١) گڕدار کردنی ئاگر؛ ٢) بریەتیە لەشەڕ بەرپا کردن‌و دنەدان بۆ هەراو کێشە[ف] ١) دامن زدن بە آتش، آتش برافروختن؛ ٢) فتنە بر پا کردن.
**ئاگر خۆش کەر:** کەسێك گڕی ئاگر زۆر دەکا، دنەدەر بۆ شەڕو هەرا، مایەفیتنە[ف] کنایە از فتنەانگیز.
**ئاگر خۆش کەرە:** ئاگر خۆش کەر[ف] فتنەانگیز.
**ئاگردان:** ١) ئاوگۆڕك، مقەڵی، جێ‌ئاگر، ئاورگ؛ ٢) جێ‌ئاگر لە سەماوەردا؛ ٣) هاویشتنی تۆپ‌و تەقاندنی بەرد بەهۆی باروت[ف] ١) آتشدان؛ ٢) آتشخان سماور؛ ٣) منفجر کردن.
**ئاگر گرتن:** ئاور تێ‌بەربون[ف] مُشتعل شُدن.
**ئاگر گوشك:** چەنە، ئەرزینگ، ئارزینگ، چەناگە[ف] زَنَخ.
**ئاگر گەشاندنەوە:** ئاور خۆش کردن بەهۆی باوەشێن[ف] آتش باد زدن.
**ئاگر گیرە:** دەستەو پۆش‌و پەڵاش بۆ بن ئاگر[ف] اَفروزنە.
**ئاگر لێ‌بارین:** بریەتیە لە توشی بەڵاو دەرد هاتن[ف] کنایە از دچارشدن بە مصیبت.
**ئاگرۆچکە:** ئاورۆچکە، ئاگری منداڵان بۆ گەمە[ف] آتش افروختن

کودکان.

**ئاگرودۆ:** ئاورو دۆکەڵ، بریەتیە لە بوونی ماڵو حاڵ ف کنایە از خانە و کاشانە.

**ئاگرۆك:** ١) بای گەرم کە گیاو سەوزە وشك دەکا؛ ٢) ئاورە کە جۆرە زیپکەیەکە لەدەمو چاو دەردێت ف ١) باد سوزانی کە سبزەها را می‌خشکاند؛ ٢) آتش پارسی.

**ئاگرۆکە:** ئاگرۆچکە ف نگا: ئاگرۆچکە.

**ئاگرە:** ١) زیپکەی چەنەو دەمو چاو، ئاگرۆك؛ ٢) بای گەرم کە بۆ زەرعات زیانی هەیە ف ١) آتش پارسی؛ ٢) باد گرم آفتِ مزروعات.

**ئاگرەکە:** ئاگرە ف نگا: ئاگرە.

**ئاگری:** چیای سەر بەرناگر، ئاگر پژێن: (چیای ئاگری سەرێ وێ بناگر بویە) ف کوه آتشفشان.

**ئاگری بن کا:** بریەتیە لە ئاژاوەچی، بنەمای شەڕوکێشە، سەرکزو لکەی بەدفەڕ ف کنایە از آدم آشوبگر و تودار.

**ئاگرێ خودێ:** بەلای عاسمانی ف بلای آسمانی.

**ئاگری ژێرکا:** ئاگری بن کا ف کنایە از آدم فتنەانگیز.

**ئاگرین:** وەك ئاگر، لەئاگر، بریەتیە لە مرۆی زۆر ئازاو بەکار یان زۆر دڵگەرم ف آتشین، کنایە از آدم بسیار شجاع و پُرکار.

**ئاگوردی:** ئاوردو، سوتەنی، سوخت، سوتەمەنی ف سوخت.

**ئاگە:** ئەوێ، وێدەرێ، ئەوێندەرێ، وێرێ ف آنجا.

**ئال:** قامکی هەرە درێژ لە پەنجەدا، تبلی ناوی، زەڕ نەقوتە ف انگشت وسطی.

**ئاڵ:** ١) ڕەنگی سووری کاڵ؛ ٢) ددانی بەترشی کول؛ ٣) جنەدۆکەی دوژمنی زەیستان، هاڵە ف ١) سرخ کمرنگ؛ ٢) کندی دندان از ترشی؛ ٣) جنِ زائوکُش.

**ئالا:** ١) بەرگی بوکەڵەی منالان: (ئالا بوك)؛ ٢) پارچەی شاش بۆ ورد دابێژتن: (ئەلا بێژ)؛ ٣) بەیداخ، عالا؛ ۴) قەڵەم: (ئالاگرت بەدەس خورشیدی خاوەر / نوسیا بۆ لای بەعەسروزی سەروەر «بەسەیتی خورشیدی خاوەر» ف ١) لباس عروسك؛ ٢) پارچهٔ تنك و نازك؛ ٣) پرچم؛ ۴) قلم.

**ئالاخ:** ئەو گیا بێ کەڵکانەی کە دەبێ فڕێ درێن، بزار ف گیاه هرزه.

**ئالات:** بەهارات، ئیسیوەت و ئەدوا ف ادویه، فلفل.

**ئالاستن:** لستنەوە، لێسان، لێسین ف لیسیدن.

**ئالاش:** هەلاش ف نگا: هەلاش.

**ئالئال:** گولێکی بۆن خوش و سوورە: (سونبول بسەماتێر و گولان پەردە دڕانـدن / بشکفتنە ئالئال و هشین بونە تەرازن) «جزیری» ف گُلی است سُرخ رنگ.

**ئالامەت:** هەلامەت، پەسو، زوکام ف زُکام.

**ئالان:** خولێ هالاندن ف پیچ خوردن.

**ئالان:** مەڵبەندێکە لە کوردستاندا ف منطقه‌ای در کُردستان.

**ئالایش:** شەونشینی بەکۆمەڵ بۆ رابواردن، کۆڕبەستنی شەواندی دۆستانە ف شب نشینی.

**ئالایی:** ١) ڕەنگاوڕەنگ؛ ٢) بەشێك لە لەشکری تورکان ف ١) رنگارنگ؛ ٢) گروهی از سپاه عُثمانی.

**ئاڵ بردنەوە:** مردنی زەیستان یان کۆرپەی ساوا بەدەست جنۆکەی ئاڵەوە ف مرگِ طفل یا مادر بوسیلهٔ آل.

**ئاڵبونەوە:** کول بونی دان بە ترشی ف کُندشُدن دندان از تُرشی.

**ئاڵتون:** زێڕ، تەلا ف طلا.

**ئاڵتی رەم:** کێشانەیەکە بەرانبەر بە پەنجاوپێنج گرام ف واحد وزنی است مُعادل پنجاه و پنج گرم.

**ئاڵچاخ:** سوکوبێ ئابڕو، بێ حەیا، دەسبڕ ف چاخان.

**ئالخواج:** قامکی شادە، تبلی دۆشاو مژە ف انگشت سبّابه.

**ئاڵدوز:** زێڕ یا زیو هفت، ڕوکێشی زێڕو زیو ف زَراندود.

**ئالستن:** لێستنەوە ف لیسیدن.

**ئاڵشت:** سەوداو مامەلە، دان و ستان ف مُعامله، دادوستد.

**ئاڵشك:** زوقم، سیخوار، خوسار، خوس ف سرماریزه، یخ.

**ئاڵش ویرش:** سەوداو مامەلە، ئاڵشت ف دادوستد.

**ئالف:** خواردەمەنی مالاتی بەرزەو ئاژاڵی وردە ف عَلَف.

**ئالفانە:** پوشانە، ئەو باجەی بۆ لەوەڕ دەستێندرێ ف باجِ چراگاه.

**ئالفتە:** هوگر، خوپێوە گرتو ف خوگرفته، الیف.

**ئالفجار:** گیاجاڕ، لەوەڕگە، چایەڕ ف عَلَفزار.

**ئاڵقە:** گەو، قولف ف حلقه.

**ئاڵقە بەگوێ:** بریەتیە لە کۆیلەو بەنی ف کنایە از غلام حلقه‌به‌گوش.

**ئاڵقەتیز:** گیایەکی گەڵا خڕی ڕەنگ زەیتونی‌یە. شیرەکەی مایەی زگ چونە ف از گیاهان داروئی.

**ئاڵقەتیس:** ئاڵقەتیز ف نگا: ئاڵقەتیز.

**ئاڵقەزێ:** زنجیرۆکەی دەرکە داخستن ف چفت.

**ئاڵقەزونە:** ئاغزونە ف سگك.

**ئاڵقەلەگوێ:** ئاڵقە بەگوێ ف نگا: ئاڵقە بەگوێ.

**ئالك:** جەمەجوێ و لاخی یەکسم ف علیق.

**ئالك:** ئالو، لوزتێن ف لوزتین.

**ئالگ:** شوێنە برین، شوێنی لێدان، نیشان لە لەش ف اَثرِزَخم یا ضربت.

**ئالگ:** لوی دیاری، گرێ لە گۆشتی لەشا ف غُدّه.

**ئالنگ:** خڕبونی بن هەنگڵ ف وَرَم کَردن زیر بغل.

**ئاڵو:** ١) هالو، بادامەی گەرو لەبن چەنە؛ ٢) نیوەتێکەڵ: (خەواڵو) ف ١) لوزتین؛ ٢) آلود.

**ئاڵو:** خاڵ، برای دایك، لالو ف دائی.

**ئاڵوباڵو:** مێوەیەکی خڕو ترش و سووری تاریکە، بەلالوك، هەلهەلوك ف آلبالو.

**ئاڵوبخارا:** هەڵوژە پایزەی سووری ئاماڵ ڕەش ف آلو بخارا.

**ئاڵوبوڵ:** قۆرە، ئاوتێ تزاوی ترش و شیرین ف میوهٔ نارسیده، کال.

**ئاڵوبەلالوك:** ئاڵو باڵو ف آلبالو.

**ئاڵوچە:** هەڵوژە، عەلوکە، حەلوکە ف آلوچه.

**ئاڵودار:** ئەو دارانەی لە خانو داپۆشیندا دەکەونە سەر کاریتە ف چوب سقف بر دیرك.

**ئالودە:** گیرۆدە، خوپێگرتوُ (ئالودەی جگەرەیە) ف مُعتاد.

**ئاڵــۆز:** ۱) تێك هاڵاو: (بــەنەکە ئاڵۆز بوە)؛ ۲) نەسازاوی توش و تورّە: (پیاوێکی زۆر ئاڵــۆزو بەد میجــازە)؛ ۳) پشێوی و ئاژاوە: (دنیایەکی ئاڵۆزە) ف ۱) سَردرگُم؛ ۲) آدم ناهنجار و بدعُنُق؛ ۳) آشوب و بلوا.

**ئالوز:** خەم و کەسەر ف غم و اندوه.

**ئاڵۆش:** ۱) خارشت و خوروی لەش؛ ۲) ئارەزو کردنی نێر: (ژنێکی زۆر بە ئاڵۆشە) ف ۱) خارش تن؛ ۲) کنایە از زن شهوت‌ران.

**ئاڵــوگــۆڕ:** ۱) پێك گۆڕینــەوە؛ ۲) داکــەندنی بەرگ و پاك دەبەر کردن: (جلە کانت ئاڵوگۆڕ کە) ف ۱) مبادلە؛ ۲) عوض کردن لباس.

**ئاڵــولــە:** ۱) کۆڵانی تەســك و باریك؛ ۲) پیاوی بێ‌شەرم و تابڕۆ ف ۱) کوچهٔ تنگ؛ ۲) مَرد بی‌حیا.

**ئاڵو واڵا:** پارچەی ڕەنگاوڕەنگ ف پارچهٔ رنگ وارنگ.

**ئاڵوویر:** سەوداو مامەڵە، ئاڵش‌ویرش ف داد و ستد.

**ئاڵــە:** ۱) جنۆکەی زەیستان کوژ؛ ۲) جلە بۆکی منالان؛ ۳) پەڵەی دەم و چاوی ئاوس؛ ۴) پارچــەی شاش بۆ دابێژتن؛ ۵) نەخــۆشیەکە لەناو گەڵ پەیدا دەبێ ف ۱) جنّ زائــوکُش؛ ۲) لبــاس عروســك؛ ۳) لکهٔ صورتِ زن آبستن؛ ۴) الك پارچەای؛ ۵) مَرضِ آتشك.

**ئاڵەبێژ:** بە پەڕۆی تەنك و شاش دابێژتن ف بیختن با وال.

**ئالها:** ئارەزو، تەما، هیوا، تاسە ف آرزو.

**ئاڵەت:** ۱) نیسیوەت، نیسۆت؛ ۲) داروکەی پەروازی شوشە یە نجەرەی قەدیم ف ۱) فلفل؛ ۲) چهارچوب شیشەهای پنجرهٔ اُرسی.

**ئاڵــەتــانج:** هەڵەتانج، جۆرێك مراوی کێوی سەر بە کڵاوەیە ف نوعی مرغابی وحشی کاکلی.

**ئاڵــەکۆك:** جۆرێ ئەسپنگی تۆکنە بنکێکی هەیە لە جۆزەرداندا دەری دێنن و دەیخۆن: (دیاری شوانە ویڵە ئاڵەکۆکە) ف گیاهی است شِنگ مانند.

**ئالەکە:** نەخۆشیەکی چاوە، تەراخم ف تَراخُم.

**ئاڵەم:** عالەم ف جهان.

**ئالی:** لا، تەرەف، رەخ ف طَرَف، سو.

**ئاڵی:** ۱) پیاوێ کە لە ژنەکەی بترسێ: (فلانەکەس ئاڵی پیوازە، ئاڵی‌یە)؛ ۲) سوکەڵە ناوی عەلی: (قۆپەی بابا ڵی) «مەسەل» ف ۱) مردی کە از زنش بترسد؛ ۲) مُخَفَّف علی.

**ئاڵیان:** ئالان، لێ‌پێچان ف بر پیچیدن

**ئالیسۆر:** هەرمێ لاسورە، سێوە لاسورە ف گلابی و سیب نیم‌سرخ و نیم‌زد.

**ئالێك:** ئالك، جەمەجۆی یەکسم ف علیق.

**ئالیکار:** یارمەتی‌دەر، هاریکار ف کمك کنندە.

**ئاڵین:** ئالان، پێچ‌خواردن ف پیچ خوردن.

**ئالینك:** گیایەکە لەداران دەهاڵێ ف پیچَك.

**ئام:** ۱) مام، برای باوك، ئاپ؛ ۲) پێشگــری هاوبەشی، ئامکار، هاوکار، هامکار؛ ۳) هاتن: (ئامو شۆت ناکەم) ف ۱) عمو؛ ۲) پَسوند اِشتراك؛ ۳) آمدن.

**ئاما:** هات بۆ پیاو ف آمد.

**ئامادە:** ساز، تەیار، حازر ف آمادە.

**ئامارات:** ئەسپابات و ئامراز ف ابزار.

**ئاماژ:** نیشانە، ئامانج ف آماج.

**ئاماژە:** ۱) سەرەرا، سەربار، زیادە لەوە؛ ۲) هێما، ئیشارە ف ۱) بەعلاوە، اضافە؛ ۲) اشارە.

**ئاماڵ:** وێچو، نزدیك‌بە: (فلانکەس ئاماڵ شێتە، رەنگی بۆزوەکە ئاماڵ شینە) ف متمایل بە.

**ئامام:** هاتم ف آمدم.

**ئامــان:** ۱) قاپ و قاچاغ، ئیر بار؛ ۲) هاتوە (بۆنێرینە)؛ ۳) دەغیل؛ ۴) وشەی پەنابردن، هانا ف ۱) ظروف؛ ۲) آمدە است (برای مُذکَّر)؛ ۳) کلمهٔ پناە خواستن؛ ۴) کلمهٔ حمایت.

**ئامانج:** ۱) نیشانە، کێلك، ئەوشتەی بۆ تیر هاویشتن دەبەرچاو دەگیری؛ ۲) دۆز، مەرام، مەبەست لە ژیانا؛ ۳) خزم و کەس و کار ف ۱) آماج؛ ۲) مَرام؛ ۳) اقوام.

**ئامــــان خواستن:** داوای تەسلیم‌بون کردن، پەنــا بەکــەسێك بردن کە بت‌پارێزێ ف اَمان خواستن.

**ئامانەت:** ۱) پارێزگاری؛ ۲) سپاردە، بۆ ماوەیەك وەرگرتن یان بەکەسێك سپاردن ف ۱) درستکاری؛ ۲) سُپُردە.

**ئاماوزێ:** پەڕۆیەکی تەنکم دەشەمی هەڵدەکێشن و دەیخەنە سەر کوان و برین، مشەما ف نوعی مشمّع.

**ئاماولوای:** هاتوچو ف آمدوشد.

**ئامای:** هاتن ف آمدن.

**ئامایی:** نەدین، کوێری، کۆری ف نابینایی.

**ئامباز:** بەتەوژم دەستەملان بون، ئاوقا، تێك هاڵانی دو زیندو ف گلاویز.

**ئامبــازبــون:** بە هەڵــە داوان بۆ یەکترچون و دەس لەمل یەك کردن ف یکدیگر را در آغوش فشُردن.

**ئامپــــا:** ۱) هاوپیشــــە، هاوپە لە کاردا: (هــەردوکمــان جوت بەنــدەی ئامپاین)؛ ۲) جوت بەندەی بەدەوڵەت و دارا ف ۱) هم درجە؛ ۲) هم پیشە.

**ئامپیاڵە:** هاودەم، هاونشین، هاوکردارو هۆگر ف ندیم.

**ئامراز:** ئەسپاب، کەرستە، ئالات ف ابزار.

**ئامڕاز:** هاوسوڕ، هامڕاز، لەیەکتر ئەمین، هەواڵی راست ف همراز.

**ئامشۆ:** هاتوچۆ، دیداری دۆستانە، سەر لەیەکدانی هاوسایان ف آمدوشُد.

**ئامك:** خوشکی باوك، پوری باوکی، مەتك، پل، مەتی ف عمّه.

**ئامڵە:** پوڵ، پارە، دراو ف پول.

**ئامۆ:** ۱) مام، برای باوك، مامۆ: (ئامۆزا)؛ ۲) ئامور ف ۱) عمو؛ ۲) خیش.

**ئاموچیار:** ئاموژگاری کار ف ناصح، اندرزگو.

**ئاموچیاری:** ئامۆژگاری ف نصیحت.

**ئامۆر:** هەوجاڕ، هێش، داری مابەینی نیر و دەندە ف خیش.

**ئامۆزا:** فرزەندی مام، برازای باوك ف عَموزاده.

**ئامۆزازا:** منالّی ئامۆزا ف فرزند عموزاده.

**ئامۆژگار:** نسحەتکەر ف اندرزگو.

**ئامۆژگاری:** نسحەت، پەند ف اَندَرز.

**ئامۆژن:** ژنی برای باوك، مامۆژن، ژنئاپ ف زَن‌عمو.

**ئامۆژیار:** ئامۆژگار ف اندرزگو.

**ئامۆژیاری:** ئامۆژگاری ف پَند.

**ئامۆش:** ئارام ف خاموش، آرام.

**ئاموشۆ:** هاتوچۆ، ئامشۆ، گەڕان، هاتن‌وچون ف آمدوشُد.

**ئاموشۆکەر:** ئەوانەی دێن‌و دەچن، کەسانێ دۆستانە یا بۆ کارێك سەر لە پیاو دەدەن ف در آمدو شُد.

**ئامۆیر:** ١) ئامۆر؛ ٢) ئامرازو ئەسپاب ف ١) خیش؛ ٢) ابزار.

**ئامە:** ١) دایك، دێ، داڵك؛ ٢) سوکەڵەی ناوی ئامینە؛ ٣) سوکە ناوی ئامان الله ف ١) مادر؛ ٢) مُخفّف آمنه؛ ٣) مُخفّف آمان‌الله.

**ئامەد:** بەخت‌و هات، ڕێکەوتی باش‌ودڵخۆشکەر ف شانس و اقبال.

**ئامەشۆ:** ئاموشۆ ف آمدو شُد.

**ئامەو:** ئامەد، هات‌و بەخت ف اقبال.

**ئامیار:** هەواڵ، هاوکار، یاریدەر ف همکار، یاور.

**ئامیان:** هەوێن، مایەی پەنیر و ماست‌و ... ف پنیرمایە.

**ئامێتە:** تێکەڵ، تێکەڵاو، لێکدراو، ئاوێتە ف آمیختە.

**ئامیتە:** ئامێتە ف آمیختە.

**ئامیتن:** تێکەڵ کردن، لێکدان، تێ کردنی شتێ لە ناوشتێ ف آمیختن.

**ئامێد:** ناوی شاری دیار بەکر ف شهری در کردستان.

**ئامێدی:** شارێکە لە کوردستان، عیمادییە ف شهری در کُردستان.

**ئامیر:** ئەسپاب، ئامراز ف اَبزار.

**ئامێر:** ئامیر ف اَبزار.

**ئامێز:** ١) باوەش، هەمێز، هامبێز، سنگ‌و بەر؛ ٢) تێکەڵ ف ١) آغوش؛ ٢) مخلوط.

**ئامێژە:** هەوێن، مایەپەنیر، ئامیان ف پنیرمایە.

**ئامێژەن:** ١) ئامێژە، هەوێن؛ ٢) شتی تێکەڵ کردن، ئامێتە ف ١) پنیرمایە؛ ٢) آمیختە.

**ئامێژەن کردن:** تێکەڵاو کردن، دوتشت تەڤ لهەڤ کرن ف بهم‌آمیختن.

**ئامین:** ١) خوایە قبوڵی کەی؛ ٢) سوکەڵە ناوی ئامینە ف ١) آمین؛ ٢) مُخَفّف نام آمنە.

**ئامینە:** هاتوە (بۆژن) ف آمده است (برای مؤنث).

**ئان:** ١) یان، یا؛ ٢) وەخت‌و عان، حان، دەم،کات، نا ف ١) یا؛ ٢) وقت، موقع.

**ئانقەس:** هەڵە لە ڕوی ئاگاداریەوە، لەقەست، لەقەستی ف عَمداً.

**ئانقەست:** ئانقەس ف عمداً.

**ئانگو:** مێلاق، ئەوتریێ‌یەی بۆزستان هەڵی دەواسن ف آونگ.

**ئان‌و ئون:** ١) ئاین‌و ئوین، نازو نوز؛ ٢) فێڵ‌و تەڵـەکـە ف ١) ناز؛ ٢) مکر و حیله.

**ئانـە:** ١) هۆوە، ئەوە، هیمـای دور؛ ٢) پاشگـری بەواتا شیاو: (پیاوانە، ژنانە، شیاوی پیاوان، شیاوی ژنان)؛ ٣) پوڵێکی هیندستانە؛ ٤) دایك ف ١) آن؛ ٢) پسوند شباهت؛ ٣) واحدی در پول هندوستان؛ ٤) مادر.

**ئانی:** هێنای، هانی، هاوردی ف آورد.

**ئانیسـك:** ١) هەنیسـك، نزکەرەی گریان؛ ٢) بەندی نێوان زەندو قوڵ، هانیشك ف ١) سکسکۀ گریە؛ ٢) آرنج.

**ئانیشا:** ئەوان، ئەمان، ئەو ف آنها.

**ئانیشك:** بەندی نێوان قوڵ‌و باسك ف آرنج.

**ئانیشکـە:** ١) جەم سەری پەرچ دراوی لولە سۆپە یان ئاسنی دەدیوار گیراو؛ ٢) دارێکی دوپـەلــە لە ئاسیاودا پێ بەرداشی پێ بەرزو نزم دەبێتەوە ف ١) زانوی لوله؛ ٢) ابزاری در آسیاب.

**ئانیك:** بەرنیسکێ ف نَفَس‌نَفَس زدن از شدّت گریه، های‌های گریه.

**ئانین:** هاوردن، هێنان، ئینان ف آوردن.

**ئاو:** ١) ئاف؛ ٢) پێشگـری هاوبەشی، ئام؛ ٣) برێتی لە شاوەت ف ١) آب؛ ٢) پسوند اشتراك؛ ٣) کنایه از مَنی.

**ئاوا:** ١) بەم جۆرە؛ ٢) ئاوەدان: (ماڵیاواکۆنە هاودەردم / بەدوُر بی‌لەئاهی سەردم) «هەژار»؛ ٣) پیوار، ون‌و نادیار: (مانگ‌ئاوابو، ڕۆژئاوابێ دێمە ماڵتان) ف ١) اینچنین؛ ٢) آباد؛ ٣) گم و ناپیدا.

**ئاوات:** ئارەزو، تاسە، هێڤی، هیوا ف آرزو.

**ئاوات‌خواز:** بەتاسە، بەئارەزو، هێڤی‌دار، هیوادار، بەهەویا ف آرزومند.

**ئاواتەخواز:** ئاوات خواز ف آرزومند.

**ئاواتەواز:** ئاوات خواز ف آرزومند.

**ئاوار:** ١) جودا؛ ٢) هەڵـوای ئاردو دۆشاوی وشك هەڵاتو بۆزستان؛ ٣) چای لێنـەری ماڵ؛ ٤) دارو پەردوی خانوی روخاو ف ١) جُدا؛ ٢) حلوا؛ ٣) آبدارچی؛ ٤) آوارخانۀ ویران.

**ئاوارتن:** جوداکرن، هەڵاوارتن، دوُرەوە خستن ف جُداکردن.

**ئاوارتە:** جیا کراوە، دوُر خراوە ف جُداشده.

**ئاوارە:** هەڵوەدا، دور لە ژێگەی خۆ، تەرە ف آوارە.

**ئاوارەیی:** هەڵوەدایی، دوری لە وڵاتی خۆیی ف آوارگی.

**ئاواز:** دەنگ‌و سەدا، دەنگی بەقەو، دەنگی ئامرازی موسیقا ف آواز.

**ئاوازە:** ناوبانگ، دەنگ‌وناو ف شُهرت.

**ئاوازەخوان:** گۆرانی بێژ، دەنگ‌بێژ، قام‌بێژ، ستران‌بێژ ف خوانندە، ترانەسرا.

**ئاوازەخوێن:** ئاوازەخوان ف خوانندە.

**ئاواژی:** بەراوەژو، سەرەونخون ف واژگون.

**ئاواسی:** ئەنگـوچك، هەنگوچك، گوچك، سۆرانی، قۆڵەکراسی فش‌و درێژ ف آستین بُلند.

**ئاواق:** ١) چۆڵ‌و بیابان، چۆڵگە؛ ٢) خانوی چۆڵکراوی بێ ئاوەدانی ف ١) بیابان برهوت؛ ٢) خانۀ متروك.

**ئاواکردن:** ١) بنیات‌نانی خانو، خانو کردن؛ ٢) زەوی نەکێڵدراو کێڵان‌و چاندن ف ١) پی‌ریختن خانە؛ ٢) شخم‌زدن‌و آباد کردن زمین بایر.

**ئاواکردنەوە:** لە دوای چۆڵیو وێرانبونی دوبارە ساز کردنەوەو کار تێدا کردن ف دوبارە آباد کردن.
**ئاواڵ:** هەڤال، دۆست، هاوڕێ ف رفیق، دوست.
**ئاواڵ دەرس:** هاوپۆل، هاوکلاس، کەسانێ کە پێکەوە لە فێرگەدا لە پۆلێکا بن ف همکلاس.
**ئاواڵ زاوا:** دوپیاو کە ژنی هەرکیان خوشکن ف باجناخ.
**ئاواڵ کراس:** دەرپێی ژنان ف شلوار زنانە.
**ئاواڵ منداڵ:** کیسەیەکی پڕ لە ئاوی مناڵدان کە لە دوای مناڵ لە زکی زەیستان دەر دەچێ، جفت ف جُفت.
**ئاواڵە:** وەکری، والا، کریاوە، دژی داخراو ف بازو گشادە.
**ئاواڵەتی:** دۆستی، ڕەفێقایەتی، هەڤاڵی ف رفاقت.
**ئاوان:** ١) ئاوا، دژی چۆڵ؛ ٢) ئاونگی دەسکاونگ بۆ شت کوتان؛ ٣) کرێ، مزە؛ ٤) گوشادە، هەراو؛ ٥) قاپو قاچاغ؛ ٦) بێ فەڕیو نازاستی ف ١) آباد؛ ٢) هاوَن؛ ٣) مُزد؛ ٤) گشاد؛ ٥) ظروف؛ ٦) کجیو نادرستی.
**ئاواناش:** مزاش، کرێی ئارد هاڕین کە ئاشەوان دەیسێنێ ف مُزد آسیابان.
**ئاوانتە:** ١) خۆڕایی، بەلاش، مفت؛ ٢) حیلەو حەواڵەو تەشقەڵە ف ١) مفت؛ ٢) کَیدو فریب.
**ئاوانتەچی:** مفتەخۆر، دەسبڕو فێڵەبازو دەبەکار ف مُفتخورو کلاەبردار.
**ئاوانی:** ئاوایی، دێ، خانو، دژی چۆڵی ف آبادی.
**ئاوا ووك:** گاڵتەچی، زۆربڵێو چەنەباز، چەقەسرۆ، چەقەسو ف وراج.
**ئاواهی:** ئاوانی، خانو ف آبادی.
**ئاوایی:** ئاوانی ف آبادی.
**ئاوبارە:** ١) داری درێژو ئەستوورو کۆڵدراو کە بۆ پەڕاندنەوەی ئاو بە سەر کەندالیدا دەکێشنو دەبێتە جۆگە، قەمتەرە؛ ٢) ئەوشیرەی کەهەنگ لە گوڵانی دەمژێو دەیکاتە هەنگوین ف ١) قنطرە؛ ٢) شیرۀ گل کە زنبور می‌مکد.
**ئاوباز:** مەلەوان ف شناگر.
**ئاوبڕ:** ١) نەخۆشیەکی ئاژاڵە کە لە خواردنەوەی ئاوی زۆرساردەوە توشی دێت؛ ٢) جێگەی دادڕین بۆ گوێزانەوەی ئاو ف ١) نوعی بیماری دام؛ ٢) محل بستنو عوض کردن مسیر آب.
**ئاوبردە:** بریەتیە لەو شتەی بە فیرۆ دەچێو خەسار دەبێ ف مُفت ازدست رفتە.
**ئاوبەر:** سەقا، ئاوکێش ف سقّا.
**ئاوبەرە:** ١) ئەو کاروانە هەنگەی لە کاتی شانە هەڵبستنا دەچنە سەر کانیاو ئاو دەبەنە پلوورەوە؛ ٢) ئەو هەنگە لە بەر بەرزەفڕی پلوورەی لێ گوم دەبێ ف ١) زنبورانی کە از چشمە آب بە کندو می‌برند؛ ٢) زنبورانی کە بە علّت بلندپروازی راە کندو را گم می‌کنند.
**ئاوبەند:** نەخۆشی زگ ئاوسان، ئیسقایی ف بیماری استسقا.
**ئاوپاش:** ئاوپژێن، دۆڵچەیەکی مەعدەنی کە سەرێکی کون کونی پێوەیەو ئاوی پێ دەپرژێنن ف آب‌پاش.
**ئاوپاڵ:** سوزمە، کەوگیر ف کفگیر.

**ئاوپرژێن:** ١) ئاوپاش؛ ٢) ئاو بە زەویدا یان بە ناندا پرژاندن ف ١) آب‌پاش؛ ٢) آب بر زمین یا برنان پاشیدن.
**ئاوپژێن:** ئاوپاش ف آب‌پاش.
**ئاوپەڕ:** ١) زەنبورەی ئاش، دارێکی کونکراوە لە بنی دۆڵاش‌دا تا ئاوەکە بە تەوژم لە پەڕە بدا؛ ٢) ئەستوور بونی برین ف ١) چوبک مُدوَر سوراخ در دهانۀ زیرین ناو آسیاب؛ ٢) دُمَل ورم کردە.
**ئاو پەڕە:** حەیوانی ئاوەکی ف حیوانِ از گلّە بجای ماندە.
**ئاوپەڕێن:** دژاو، زەویەکی ئاوداشتنی دژوار بێ ف زمینی کە آبیاریش دشوار باشد.
**ئاوتێزان:** ١) ترێ کە تازە دێ ئاڵو بۆڵ بێ؛ ٢) ئاوێ کە لەدیتنی ترشی لەزمان پەیدا دەبێ؛ ٣) ئاوێ کە لە پاك کردنی پیواز لەچاو دێت ف ١) آبدارشدن قورۀ انگور؛ ٢) آب در دهان جمع شدن با دیدن ترشی؛ ٣) آب از چشم آمدن از پاك کردن پیاز.
**ئاوجز:** ١) ئاودز، قەڵشتو کەلێن کە ئاو بدەلێنێ؛ ٢) کۆبونەوەی کێمو زوخ لە بریندا ف ١) جای ترشح آب؛ ٢) جمع شُدن ریم در زخم.
**ئاوجۆ:** قەخوارنە کە لجەهـ چێدکن، بیرە ف آبجو.
**ئاوچاودان:** لە تماشا دڵخۆش بون ف از دیدن لذّت بردن.
**ئاوچاوسەنن:** ترساندن، زراو بردن، تۆقاندن ف زهرە ترك کردن.
**ئاوچایگ:** ئاوی سارد، ئاڤا تەزی ف آب خنك.
**ئاوچنین:** ئاوگرتن لە مێوەو ... ف آب گرفتن از میوە و...
**ئاوخانە:** ئاودەست، ئاودەسخانە، ئاورێژ ف مُستراح.
**ئاوخواردنەوە:** ئاڤ قەخارن ف آب نوشیدن.
**ئاوخواز:** خواردنێك کە تونیایەتی دێنێ. دەڵێن: (کەشكو نیسك **ئاوخوازن**) ف غذای شورو آبکش.
**ئاوخۆر:** کەسێ کە ئاو دەخواتەوە، ئاوگێڕ لە مزگەوتو کۆر بانگ دەکا: (ڕەحمەت لە **ئاوخۆر**) ف آب آشام.
**ئاوخۆرە:** ١) ڕەگی سەرەکی گیاو دار کە زۆر تەڕایی هەڵدەمژێ؛ ٢) ناوەڕۆکی لق کە تەڕایی ڕا دەگوێزێ؛ ٣) پیاڵەو شەربەی ئاوخواردنەوە، لیوان، قومقومۆك ف ١) آبخور درخت؛ ٢) آوند گیاهان؛ ٣) ظرف آبخوری.
**ئاوخۆری:** ١) هەرچی ئاوی پێ دەخۆنەوە، شەربە، زەرك، لیوان، قومقومۆك؛ ٢) دانە لغاو، ئەو ئاسنەی دەچێتە ناو دەمی یەکسمەوە ف ١) ظرف آبخوری؛ ٢) دهانۀ لگام.
**ئاودادان:** ١) ئاو قوتدانی زەوی؛ ٢) نەخۆشیەکە لاقی یەکسمو بەرزە ولاخی پێ دەماسێ ف ١) فرورفتن آب در زمین؛ ٢) پاغر.
**ئاودار:** ١) ولاتی ئاو زۆر؛ ٢) میوەی پڕاو؛ ٣) تیغی جەوهەردار ف ١) منطقۀ پُرآب؛ ٢) میوۀ آبدار؛ ٢) بُرَند.
**ئاوداشتن:** ئاودێران، ئاودێری، ئاودانی زەوی ف آبیاری.
**ئاودامان:** کراس یان کەوای داوێن شۆڕ: (کەوای مەلایان **ئاودامانە**) ف پیراهن بُلند.
**ئاودامێن:** ئاودامان ف پیراهن بُلند.
**ئاودان:** ١) ئاوداشتن؛ ٢) مالات تێراو کردن؛ ٣) تیغ سوور کردنەوە بە

**ئەناز:** داخراو، فرێدراو، راخراو: (زێڕ و خاوەن زێڕ پایەنازت بۆ) ف أنداز.

**ئەنازە:** ئەندازە، بارست، قاس ف اندازە.

**ئەنام:** ئەندام، ئازای لەش ف اندام.

**ئەنبار:** ئەمار، عەنبار ف انبار.

**ئەنباز:** هاوئامێز، هاو باوەش، باوەش تێك وەرێناو ف هم‌آغوش.

**ئەنتەر:** جۆرێك مەیمون، قونسوڕ، حەمتەر، عەنتەر ف عَنتر.

**ئەنتیکە:** ١) کەموێنە؛ ٢) کەل‌و پەلی زۆر کەونارا ف ١) کم‌یاب؛ ٢) عتیقە.

**ئەنتیکەخانە:** خانوی کەل‌و پەلی زۆر لەمێژینەی تێدا هەڵدەگیرێ، مۆزە ف موزە.

**ئەنتیکەفرۆش:** فرۆشیاری شتی کەونارا ف عتیقە فروش.

**ئەنتیکەناس:** ئەوی لەشتی کەونارا شارەزایە ف عتیقەشناس.

**ئەنجا:** ئەم‌جار، ئەم دەحفەیە، ئەمجا، ئەم دەحە ف این بار، این‌دفعە.

**ئەنجار:** ئەمجار، ئەنجا ف این بار.

**ئەنجام:** دوایی، دوماهی، ئاقیبەت ف أنجام.

**ئەنجامە:** لاولاوەی دەرك‌و پەنجەرە ف لولا.

**ئەنجن:** وردکردن‌و جنین بە تیخ: (**ئەنجن ئەنجن:** زۆروردکردن بەتیخ)، (کەسینەی ریشمی بەوتیغی نازەی **ئەنجن ئەنجن** کرد / وتی: پەژمردەیە ئەم لازارە ئاوی تێدەگرم) «مەحوی» ف انجیدن.

**ئەنجناو:** لەت لەت کراو بە تیخ ف انجیدە.

**ئەنجراو:** ئەنجناو ف انجیدە.

**ئەنجنین:** وردکردن بەتیخ ف انجیدن با تیغ.

**ئەنجوڕ:** عەنجور، خرچە، کاڵەکی کاڵ، گندۆرە ساوای نەگەیشتو، قەرە خرچە ف خربزۂ نرسیدە.

**ئەنجومەن:** کۆڕ، کۆم‌بون، مەجلیس، مەلیس ف أنجُمن.

**ئەنجە:** وردە پارچەی بچوك‌و باریك ف ریزە.

**ئەنجەت:** بەهانە، بیانو، مەهانە، بیانگ، بیانك ف بهانە.

**ئەنجەل:** ئەجەل ف أجَل.

**ئەنجینە:** قەڵا شکەری، داری شکاو بۆ ئاگری زستان، ئێزنگ، ئێزینگ ف هیزُم.

**ئەنجێنە:** ١) ئەنجینە؛ ٢) ناوی گوندێکە لای بانە ف ١) هیزم؛ ٢) نام دهی است در اطراف بانە.

**ئەنحام:** بەخشش، پاداشتی خزمەتکار سەرەڕای مز، ئەنعام، خەڵات ف انعام.

**ئەنـد:** لەدوای ئەوە یان ئەمـە دێت، واتا: (**هەند، هێند، چەند**). (**ئەوەند** وشیارە «مـەحوی» تێدەگا دنیا خەراباتە / خەرابەی گەردەکا ئەهلی خەرابە بۆچی لێ دەگرم) «مەحوی» ف پسوند بعد از این یا آن می‌آید. بەمعنی مقدار.

**ئەنداز:** ئەنازە ف أندازہ.

**ئەندازە:** ئەنازە ف أندازە.

**ئەندازەگر:** پێوەر، لەگەزدەر ف اندازەگیر، مسّاح.

**ئەندازیار:** زانای ئەندازە گرتن، موهەندیس ف مُهندس.

**ئەندام:** ١) ئەنام، لەش، ئازای لەش؛ ٢) هاو بەش لە کۆمەڵێکدا ف ١) أندام؛ ٢) عضو.

**ئەندامەتی:** هاوبەشی لە کۆمەڵێکی هاومەبەست‌وهاودۆزدا ف عضویّت.

**ئەندۆ:** کوڵ، خەم، کەسەر، غەم، پەژارە، خەفەت: (ئەوەند زاری کەرد نە ئەندۆی دەرۆن / خوڕۆش کەرد نەسەنگ قولەی بێستون) «خانا» ف أندوە.

**ئەندوکە:** ئەوەندوکە، هێندێکی کەم ف مقداری کم.

**ئەنـدەرون:** ١) هەناو، ناو ورگ؛ ٢) خانوی ژن‌و منالی پیاوی گەورە، هندرو، هوندرو ف ١) درون؛ ٢) أندَرونی.

**ئەندێش:** ١) بیر کردنەوە؛ ٢) ترس‌و خۆف ف ١) اندیشە؛ ٢) بیم و هراس.

**ئەندێشە:** ئەندێش ف نگا: ئەندێش.

**ئەنزەروت:** جیوەی دارێکی تاڵە بۆ دەرمانی برین دەکار دەکرێ: (پشتی ریش‌و شانی زامدارو جدەو بو ناعیلاج / چەند قرۆشێکم هەبو، بۆمدا بە نەوت‌و **ئەنزەروت**) «شێخ رەزا» ف أنْزَروت.

**ئەنعا:** راستی وەشارتن، ئینکێری، ئینکار ف اِنکار.

**ئەنعام:** ئەنحام، خەڵات ف أنعام.

**ئەنقەست:** ئانقەست ف عَمداً.

**ئەنقەست:** ئانقەست ف عَمداً.

**ئەنگ:** پاشگری ئامرازیە: (**کوڵەنگ، تفەنگ**) ف پسوند ابزاری.

**ئەنگافتن:** پێکان، هەنگاوتن، لەنیشانەدان، لئامانج خستن ف بەهدف زَدن.

**ئەنگافتە:** پێکراو، هەنگواو، هەنگاوتە، هەنگاوتو ف تیرخوردە.

**ئەنگامە:** ئاپۆرەی مەردم‌و هەراو هوریاو زەنا زەنا ف هنگامە.

**ئەنگاوتن:** ئەنگافتن ف بەهدف زدن.

**ئەنگاوتو:** ئەنگافتە ف تیرخوردە.

**ئەنگاوتە:** ئەنگافتە ف تیرخوردە.

**ئەنگڕان:** لە ئەنـدازە دەرچون، لە ڕادە بەدەر: (هێند دارایە **ئەنگڕاوە**)، هەنگڕان ف از حَدّ گُذشتن.

**ئەنگڵ:** ١) دەسکە دەفری بەئاڵقە، قوڵف، هەنگڵ؛ ٢) قوڵ لە لای شان: (**بنەنگڵ**) ف ١) دستۂ سَبو؛ ٢) کتف.

**ئەنگۆ:** هنگ، هنگو، ئێوە، هون، هەوە، وە، تۆ و خەڵکی تر ف شُما.

**ئەنگوا:** پێکرا، لێدرا، هەنگاوترا، پێکیا ف زدە شد.

**ئەنگوان:** پێکران، پێکیان، هەنگێوران ف بەهدف خوردن.

**ئەنگواو:** پێکراو، ئەنگافتە ف تیرخوردە.

**ئەنگـوتك:** گوتك، گونتك، گونك، تۆپەڵە هەویری خڕ هەڵدراو بەشی نانێك. (**ئـەنگـوتـك** بژێر: خەسیس‌و رژد). (**ئـەنگـوتك** گرتن: خڕ هەڵدانی هەوێر بۆنان) ف چونە.

**ئەنگوتن:** ١) هەڵاتنی تاك ئەستێرە: (گەلاوێژ **ئەنگوت**)؛ ٢) هەڵکردنی بای هێدی: (هەناسەم زولفەکەی لاداو مەیلێکی نەکرد چاوی / نەسیم **ئەنگـوت**و شەو رابـردو نەرگس هەر لەخـەودایە) «نـالی»؛ ٣) پاش وشەی «هەڵ» دێت بەمانا توش بون، کەوتن ف ١) طلوع ستارە؛ ٢)

وزیدن مُلایم؛ ۳) پسوند بەمعنی دُچار شدن.
**ئەنگوچك:** لەوەندی، گوچك، فەقیانە، فوڵە کراسی فش‌و فوڵ‌و درێژ ف آستین بُلند.
**ئەنگوچکە سوّرانی:** ئەنگوچك ف آستین بُلند.
**ئەنگوُر:** ترێ، تری، بەری ڕەز، میوەی داری مێو ف اَنگور.
**ئەنگوّرە:** ۱) دەمی ئێوارە؛ ۲) سەرەتای هەڕەت: (لە ئێستاڕا **ئەنگوّرەی** میوەیە)؛ ۳) ئەوکـاتـە، ئەوسا، ئەودەم: (مەسلەحەت ناکرێ بەزوّرە با ئێوارە دابێ، **ئەنگوّرە**، تێی دەبینین مەسڵەحەتێ...) «فوّلکلوّر» ف ۱) تنگ غروب؛ ۲) موسم؛ ۳) آنگاە.
**ئەنگوُس:** قامك، کلك، تبل، تلی ف انگُشت.
**ئەنگوست:** ئەنگوس، ئەنگوستەچاو: زوّر تاریك ف انگشت.
**ئەنگوستەویلە:** کلکەوانە، هەنگولیسك، ئەنگوشتەر ف انگُشتری.
**ئەنگـوستیلە:** ۱) ئەنگـوستـەویلە: (ئـەنگـوستیلەی درومانان)؛ ۲) ئەنگوستانە ف ۱) انگشتری؛ ۲) انگشتانە.
**ئەنگیر:** ئەنگور، هەنگور ف اَنگور.
**ئەنگێز:** هەڵایسێن، هانەدەر، دنەدەر ف انگیز.
**ئەنگیز:** ئەنگێز: (ژرەعنـا نێرگزێن تەی مەست‌و خونـریز / زەمـان بو عەهدی جەنگ **ئەنگیزی** چەنگیز) «جزیری» ف انگیز.
**ئەنگێزە:** هوّ، مایەی سەرەکی ف انگیزە.
**ئەنگێو:** پێکـەر، لێدەری ئامـانـج: (نیشانە **ئەنگێوی** چاکە، شینی گا ئەنگێو) ف هَدَف‌زن.
**ئەنگێوران:** پێکران، ئەنگوان، وەنیشانەکەوتن ف بە هدف خوردن.
**ئەنگێوراو:** پێکراو، هەنگواو، ئەنگافتی ف تیر خوردە.
**ئەنگێوە:** ۱) دەست ڕاست، نیشـان ئەنگێو، لەئـامـانج دەر؛ ۲) زەنەی سەرپیت ف ۱) تیرانداز ماهر؛ ۲) سکون حروف.
**ئەننە:** ئەونە، ئەوەندە ف آنقدر.
**ئەنو:** ئەندۆ، خەم، پەژارە ف اَندوە.
**ئەنوا:** ۱) پەناو پەسیو، جێ حەوانەوەی شەو؛ ۲) شوێنی باران نەگر ف ۱) پناهگاە، جای آرمیدنِ شب؛ ۲) جایی کە باران آن را نگیرد.
**ئەنوچك:** ئەنگوچك ف آستین بُلند.
**ئەنوُیر:** ترێ، بەری ڕەز، هەنگور ف اَنگور.
**ئەنە:** هەوێ، هەڤی، هەوە، هەوو: (دوژنی مێردێك **ئەنەی** یەکترن) ف هَوو.
**ئەنەزا:** توّرە، کچی هەوێ، قیزا هەڤی ف دُختر هَوو.
**ئەنی:** هەنیە، توێڵ، ناو چاوان ف پیشانی.
**ئەنێش:** ئەندێشە ف بیم.
**ئەنیشك:** ئانیشك ف آرنج.
**ئەنیوُر:** ترێ ف انگور.
**ئەو:** ۱) هێما بوّ یەکی دور؛ ۲) هێما بوّیەکی نزیك؛ ۳) هێما بوّ کوّمەڵی نزیك یان دور؛ ۴) لە: (سەوزە وستەن فەرش **ئەو** چەمەن دەس دەس) «مەولەوی» ف ۱) آن؛ ۲) این؛ ۳) اینها، آنها؛ ۴) در.
**ئەوا:** وشەی خەبەردان لە ڕوداو: (ئەوا لەیلا بەڕوّژی حەشر ئەدا وەعدەو دەڵێ «مـەحـوی» / هەتـا قامی قیامەت ئاهو واوەیلا نەکەم چبکەم) «مەحوی» ف اینك.
**ئەوار:** ۱) پاشگـری هەبون: (خوێندەوار، ئومێدەوار)؛ ۲) شوێن‌وجی: (شوێنەوار، ئاسەوار) ف ۱) پسوند مالکیّت؛ ۲) پسوند مکانی.
**ئەواری:** ۱) پاشگـر بەواتـا هەبـون: (کـوّڵەواری)؛ ۲) بەمانا جێگە: (کوردەواری) ف ۱) پسوند ملکی؛ ۲) پسوند مکانی.
**ئەواگل:** گەڕانەوە، ڤەگەر، وەگەڕان ف بازگشت.
**ئەوان:** ۱) ئەوا نەی دور؛ ۲) ئەم نزیکانە؛ ۳) پاشگری ئاگادار، پارێزگار: (باخەوان) ف ۱) آنها؛ ۲) اینها؛ ۳) پسوند حفاظت.
**ئەوانتر:** کەسانی دیکە ف آنهای دیگر.
**ئەواندن:** خوّش‌ویستن، حەباندن، خوەش گەرەك بون ف دوست داشتن.
**ئەوانە:** یانە، ئەو چەند کەسە، ئەو چەند شتە ف آنها.
**ئەوبەر:** ڤێ ڕەخی، لای ئەولا ف آن‌طرف.
**ئەوتر:** ئەوی‌تر، ئەوی‌دیکە ف دیگری.
**ئەوتوّ:** بەم‌جوّرە، وتو، ئەوها ف این‌طور.
**ئەوج:** تەشق، بڵندایی ف اوج.
**ئەوجا:** ۱) ئەم کەڕەتە، ئەوسایە، ئەم‌دەم؛ ۲) کەوایە، کەوابو ف ۱) این‌بار؛ ۲) پَس.
**ئەوجار:** ئەوجا ف دیگر.
**ئەوجـاڕ:** ۱) دو خوشکی ژنی دوبـرا بوّ یەکتر؛ ۲) یەرەق ف دو خواهر همسر دو برادر؛ ۲) خیش.
**ئەوجارە کانێ:** ئەوجا ف این‌بار.
**ئەوجارە کە:** ئەوجا ف این‌بار.
**ئەوجە:** نیاز، ئاتاجی، پێداویستی ف احتیاج.
**ئەودالْ:** هەڵوەدا، ئاوارە ف آوارە.
**ئەودەر:** دەرەوە، بەرانبەر بە ژورەوە، دەرڤە ف بیرون، خارج.
**ئەور:** هەور، عەور ف اَبر.
**ئەورا:** برسیەتی، نێز، برسیایەتی ف گُرسنگی.
**ئەوراز:** عەڤراز، هەوراز، سەربەرەو ژورە، بەرەوژور ف سر بالایی.
**ئەورە:** ئەوێ، ڤێدەرێ، بەرانبەری ئێرە ف آنجا.
**ئەوسا:** ئەودەم، ئەوکات، ڤێ گاڤێ ف آن دَم.
**ئەوساکە:** لەودەمدا، لەوێ چاخی‌دا ف آن‌دَم.
**ئەوسار:** هەوسار، پەتوکەی بە ڕشمەوە بەستراو، پەتی ملی گوّڵك، دەسکە ڕەشمە ف اَفسار.
**ئەوق:** قەتیس، دەرەتان لێ بڕاو، گیر خواردو ف گرفتار.
**ئەوقە:** گیروّدە، دوچار، توش ف دُچار.
**ئەوك:** گەرو، قوڕ قوڕاچکە، بەرمل ف گلو.
**ئەوکێ:** فلانکەس، هین، وانێك، هەرامە، واك ف فُلان.
**ئەوگار:** کزو داماو، سیس هەڵگەڕاو ف اَفگار.
**ئەولا:** ڤێ ڕەخ، ئەو تەرەف ف آن‌طَرف.
**ئەولاتر:** دورتر، بەولاوەتر ف آن‌طرف‌تر.

**ئەولایە:** ئەم تەرەفە، ئەم بەرە ف این طرف.

**ئەولاد:** رۆڵە، فرزەند ف أولاد.

**ئەولە:** خاترجەم ف بطورِ قطع، یقیناً.

**ئەولەق:** ئەبلەق، دوڕەنگ، بازو، بازگ ف اَبلَق.

**ئەوە:** هێما بۆ دوور و نزیك، یە ف این، آن.

**ئەوەتا:** خۆیەسی، هەوە ف خودش است.

**ئەوەتە:** ئەوەتا ف خودش است.

**ئەوەتەی:** لەوساوە، لەوکاتەوە، ژڤێ ڤەختی، لەودەمەوە ف از آن دم.

**ئەوەتی:** ئەوەتەی ف از آن دَم.

**ئەوەجە:** موحتاج، ئاتاج ف مُحتاج.

**ئەوەر:** پاشگری بون و خاوەن: (بەختەوەر، سەروەر، هونەروەر) ف پسوندِ مالکیّت.

**ئەوەسا:** ئەمەیە، ئەوەتا ف این است.

**ئەوەسە:** ئەوەسا ف این است.

**ئەوە کە:** شتەکە، وانەکەکە، هەرامەکە ف چیز.

**ئەوەڵ:** یەکەم، نێکەمین، هەوەڵ ف اوّل.

**ئەوەنامای:** رۆیشتنی بێ گەڕانەوە ف رفتن بی بازگشت.

**ئەوەند:** ئەوچەندە، هێندە، ئەوقاس ف اَند، آن قَدَر.

**ئەوەنـدە:** ١) ئەوهـەندە، ڤێقاسێ: (ئەوەندە چەندە؟)؛ ٢) هەرچەندی: (ئەوەندە دەکەم نایەتە ڕدایە) ف آن قدر؛ ٢) هرچند.

**ئەوهە:** ئەمە، ئەڤە، یە ف این.

**ئەوەی:** ئەوکەسەی، ئەوشتەی، ئەوی، ئەڤێ ف آن کس، آن چیز.

**ئەوەیان:** لەو چەندانە، ئەم یەکە ف این یکی.

**ئەوی:** هەرکێ، هەرکەسێك، هەرچی ف هرکسی، هرکه.

**ئەوێ:** ١) دەبێ، پێویستـە؛ ٢) ئێرە نا ئەوێ، بۆ دورتـر؛ ٣) شایەت، وێدەچێ: (تـۆ بێژی ئازادبین؟ ئەوێ)؛ ٤) فەرمـانی پێك‌هاتن، لازم: (ئەوێ هەر بچی بۆشار) ف ١) لازم است؛ ٢) آنجا؛ ٣) شاید؛ ٤) باید.

**ئەویان:** تاق کردنەوە: (**ئەویانم** گەرەکە، **ئەویان** ناردبو) ف او را.

**ئەویانە:** ئەویان ف او را.

**ئەویتر:** ئەوەکەی دیکە، ئەڤێ دیتر ف دیگری.

**ئەویچ:** ئەویش: (نەك تەنها من یا تۆ، **ئەویچ** هاتبو، **ئەویچ** خزم خۆمانە) ف او نیز.

**ئەویدی:** ئەڤیتر، ئەوی‌دیکە ف آن دیگر.

**ئەوی‌دیکە:** ئەویدی، ئەوێدن ف آن دیگر.

**ئەوێستا:** ١) کتێبی زەردەشت؛ ٢) نهو، نوکە: (هەتا تۆم ئاشنا بوی ئاشنا بون/**ئەوێستا** مو بەمو ئەغیارە بێ‌تۆ) «نالی» ف ١) اَوستا؛ ٢) اکنون.

**ئەوێستاکە:** هەرئێستا، هەمانهو، نوکە، هەوکە ف هم‌اَکنون.

**ئەوێستاکێ:** ئێستا، ئەم دەمە ف اکنون.

**ئەویکە:** ئەویتر، ئەڤێدن ف آن دیگر.

**ئەوین:** ئەڤین، دڵداری ف عشق.

**ئەویندار:** عاشق، دڵدار ف عاشق.

**ئەوینداری:** عاشقی، حەزلێکەری، دڵداری، ئەڤینی ف عاشقی.

**ئەوینی:** ١) دڵداری، عشق؛ ٢) چاوت پێ دەکەوی، دەیبینی، ئەیوینی ف ١) عشق؛ ٢) می‌بینی.

**ئەوینێ:** دەبینێ، دێتە بەرچاوی، چاوی تماشای هەیە ف می‌بیند.

**ئەوێها:** ئەوەتانێ، خۆیەسی ف خودش است.

**ئەهـ :** وشەی وەڕەزی و گوێ نەدان: (**ئەهـ** چی لێ بکەم؟) ف حَرفِ تَنَفُّر.

**ئەهـا:** ١) وشـەی ئاگا کردن: (**ئەها** هات)؛ ٢) وشەی عەزرەت: (**ئەها** شیرەکە ڕژا)؛ ٣) وشەی باوەڕ بە سەیرمانەوە: (**ئەها** کەوابێ خەنی بوە) ف ١) حَرفِ تنبیه؛ ٢) حرفِ تَحَسُّر؛ ٣) حرفِ تصدیق و با تَعَجُّب.

**ئەهاك:** قسڵ، کلس، ئاهەك ف آهك.

**ئەهالی:** خەڵکی ئاوایی تێکڕا: (کوێخا بە **ئەهالی** گوندی راگەیاند بچنە بێگار) ف اهالی.

**ئەهاو:** ١) هۆ، بانگ کردنی دور، هۆی؛ ٢) وشەی گەمەپێ کردن: (**ئەهاو** بۆ کارێ کردت) ف ١) اهان: ٢) کلمهٔ تَمَسخُر.

**ئەهای:** هۆی، بانگ کردنی دور ف اهان.

**ئەهل:** ١) دانیشتوی جێگەیەك، خەڵکی ئاوایی: (کاورا **ئەهلی** شارە)؛ ٢) شیاوی هەوالـەتی و مەرد: (فـلان لە ڕەفـاقـەتدا زۆر **ئەهلە**)؛ ٣) هۆگر و خەریك: (**ئـەهلی** ئیمـان، **ئەهلی** حاڵ، **ئەهلی** خێر، **ئەهلی** کەیف و...) ف ١) مُقیم؛ ٢) شایسته؛ ٣) مشغول به.

**ئەهـوُ:** وشـەی سەیرمـان و وەڕەزی: (**ئەهوُ** ئەوە دەڵێی چی؟) ف حَرفِ تَعَجُّب و تَنَفُّر.

**ئەهۆ:** ئەهو ف حَرفِ تَعَجُّب و تَنَفُّر.

**ئەهۆی:** هۆهۆ، بانگ کردنی دور ف های.

**ئەهێو:** وشەی گاڵتە پێکردن: (**ئەهێو**، تەڕت پێك نەهێنا) ف تَمَسخُر.

**ئەی:** ١) وشەی گازی: (**ئەی** بابە سوُتام)؛ ٢) ئەدی: (**ئەی** کەی دێت؟)؛ ٣) مەگەر: (**ئەی** نەمگوت مەچۆ؟)؛ ٤) ئەمە، ئەیە، یە: (جارێ تر **ئەی** قسیە نەکـە)؛ ٥) بۆ سەیرمان: (**ئەی** کە سەیرە!)؛ ٦) بۆ کوڵ و داخ: (**ئەیْ‌رۆ**، **ئەی** ماڵی وێرانم!) ف ١) حرفِ ندا؛ ٢) پس؛ ٣) مگر؛ ٤) این؛ ٥) حرفِ تَعَجُّب؛ ٦) حرف تأثُّر.

**ئەیار:** مانگی پێنجـەمی خاچ‌پەرستان، لەنێوان خاکەلێوەو بانەمەڕدا ف ماه پنجم مسیحی.

**ئەیارە:** پێوانە، دەفرێ کە شتی وردی وەك دەغڵی پێ دەپێون، عەیارە ف پیمانە.

**ئەیاغ:** ١) چروك، قرپۆك، بێ‌برەو: (مەڕەکانت بە **ئەیاغەوە** لێ دەکڕم، یان، **ئەیاغـی** لێ دەرداوێژم)؛ ٢) رەهـەنـد، ژێراوی ئاوی پیس و ئاودەسخانە ف ١) بُنجُل؛ ٢) فاضلاب.

**ئەیر:** ئاگر، ئاور ف آتش.

**ئەیرۆ:** ١) وشەی سەیرمان: (**ئەیرۆ** خوشکێ چەند سەیرە؟!)؛ ٢) وشەی خەم خۆری: (**ئەیرۆ** ڕۆڵەڕۆ)، هەیرۆ ف ١) حرف تَعَجُّب؛ ٢) حرف تأسُّف.

**ئەیرەکڵێ:** گەمە بە ئاگر، ئاتەشبازی، ئاگر بازی ف آتش‌بازی.

**ئەی‌لۆ:** هەڵـۆ: (ئـەیلوێ پیر)؛ ٢) بچکۆڵەی قشت و جوانکیلە: (**ئەیلۆ**

گەزەگەزە نازانێ) [ف] ١) عُقاب؛ ٢) حرفِ نوازش کودك.

**ئەيلول:** مانگی نۆیەمی خاچپەرستان، لە نێوان ڕەزبەرو خەزەڵوەرا [ف] ماهِ سپتامبر.

**ئەینْك:** ئاوێنە، جام [ف] آینه.

**ئەینە:** ئەوێ، بەرانبەری ئێرە [ف] آنجا.

**ئەینی:** ئین، هەینی، هەینو، ڕۆژی جوعمە [ف] روز جمعه.

**ئەیوان:** هەیوان، سەکۆی سەر داپۆشراو [ف] ایوان.

**ئەیە:** ئەمە، ئەڤە [ف] این.

**ئەیەت:** دێت، دێ، دەگاتە ئێرە [ف] می‌آید.

**ئەیەڕۆ:** وشـەی سەیرمان: (**ئەیەڕۆ** خوشکێ جاتۆ باوەڕ دەکەی؟!) [ف] حَرفِ تَعَجُّب.

**ئەیەلۆ:** بۆ دواندنی منالّی خشپیلانە [ف] حرف نوازش کودك.

**ئەیهۆ:** وشەی نارەزایی‌و وەڕەزی: (**ئەیهۆ** چەند قسە دەکەی) [ف] حرف تنفُّر.

**ئەیهوُ:** وشەی هەرگیز نەشیاو‌هەیهات: (**ئەیهوُ** تازە من گەنج دەبمەوە؟!) [ف] هَیهات.

**ئەیهوُت:** چلەی بچوك [ف] چلّه کوچك.

**ئەیی:** کەوابو، کەوایە [ف] که این‌طور.

**ئی:** ١) وشەی ملْکایەتی: (ئەو ماڵە **ئی** منە، **ئی** تۆ بو دایان بەمن)؛ ٢) ئەم، یە: (ئیرۆ، ئیشەڤ، ئیساڵ، ئیجا)؛ ٣) بۆپرسیار: (ورچێکم گرت. **ئی**؟!) [ف] ١) حرف تملُّك؛ ٢) این؛ ٣) سؤال تأکیدی.

**ئێ:** ١) دەی، دەت فەرموُ؛ ٢) بەڵێ: (دەڵێن پەڵەی داوە. **ئێ** ڕاستە)؛ ٣) شانــدەری جسنی مێو ینـــە: (کیژێ، خانمێ، دایکێ)؛ ٤) وشـەی ملْکایەتی: (**ئێ** من بی تە بۆ خۆ برد) [ف] ١) بعد؟؛ ٢) آری؛ ٣) علامت تأنیث؛ ٤) حرف تملُّك.

**ئیبنوعەبباسی:** تایفەیەکە تفیان دەرمانی مارەو خوێنیان دەرمانی هارە [ف] طایفه‌ای که آب دهانشان درمان مارگزیده و خونشان درمان هاری است.

**ئیبۆ:** سوکەڵەی ناوی ئیبراهیم [ف] مخفّف ابراهیم.

**ئیپە:** بەنی قایشە جوت، بەندی قایشە نیر [ف] حلقهٔ چرمی که با آن یوغ را به خیش می‌بندند.

**ئیتر:** ئیدیکە، ئێدن [ف] دیگر.

**ئیتریس:** ڕەزاگەران، جێ‌قێز، خوێنتاڵ [ف] بدشکل.

**ئێتی:** پاشگر بەواتای ئایەتی: (**برسێتی، کوردێتی**) [ف] پسوندِ نسبت.

**ئێتیم:** سێو ی، بێ دایو باب، هەتیو، هەتیم [ف] یتیم.

**ئیجا:** دەی ئەمجار چی؟ ئەوجا [ف] حالا چطور.

**ئیجاب:** پێویست: (ئیجاب ناکا خۆت ماندوکەی) [ف] لازم.

**ئیجات:** ئیجاد [ف] ایجاد.

**ئیجاد:** بنیات، سازدان، ئاواکردنەوە: (ئەم خانوە تازە **ئیجادە**، ئەم زەویە چۆڵ بو خۆم **ئیجادم** کرد) [ف] آباد کردن.

**ئیجار:** ١) ئەمجار، ئەم‌کەڕەتە؛ ٢) کرێ [ف] ١) این‌بار؛ ٢) کرایه.

**ئیجارە:** کرێ: (باغم **ئیجارە** کردوە)، (**ئیجارەدار**: کرایەچی) [ف] اجاره.

**ئیجــازە:** ١) ماوە، دەرفەت، وچان: (**ئیجازەی** دو ڕۆ ژم دەیە، **ئیجازەی** پێ نەدام بچمە ژور)؛ ٢) فتواو دەستو ر: (**ئیجازەی** ماری هەیە، فەقێ **ئیجازەی** وەرگرت) [ف] ١) فرصت؛ ٢) فتوا و دستور.

**ئیجبار:** زۆرەکی، خورتی، ناچارکردن: (بە **ئیجبار** ناردمی، ئاغا **ئیجباری** کردم نان بخۆم) [ف] اجبار.

**ئیجباری:** سەربازی زۆرەکی لە دەوڵەتدا [ف] سربازی وظیفه.

**ئێجگــار:** زۆرو زەمـەنـد، فرەفرە، گەلەك، زێدە، یەکجار: (**ئیجگار** زۆر باشم) [ف] بسیار.

**ئێجگاری:** یەکجاری، بەتەواوی، بێ‌وەگەڕان‌و دوپات کردنەوە، هەرگیز، ئیتـر قەت: (**ئێجگــاری** بارم کرد، **ئێجگاری**نایدوێنم) [ف] یکباره، به‌تمامی.

**ئێجگارەکی:** ئێجگاری [ف] یکباره.

**ئیحتــوبــار:** ١) قورسـاغ، وەج‌و ڕێز؛ ٢) متمانە، باوەڕی: (پیاوێکی بە **ئیحتوبارە**) [ف] ١) و ٢) اعتبار و آبرو.

**ئیحــتــیات:** ١) پارێز: (دەچـیە چیا لە مار **ئیحـتـیاتت** هەبێ)؛ ٢) کار قایمی: (پیاوێکی بە **ئیحتیاتە**) [ف] ١) احتیاط؛ ٢) محکم‌کاری.

**ئیحتیلام:** ١) خەو بەگانـەوە دیتن‌و ئاوی شاوەت ڕشتن؛ ٢) لە منـاڵی ڕەهابون، بلۆق‌بون: (مناڵنیە **ئیحتیلام** بوە) [ف] ١) احتلام؛ ٢) بُلوغ.

**ئیحتیاج:** ئاتاجی، چاولەدەستی [ف] نیاز، احتیاج.

**ئیحتیمال:** وێچون، لەوانەیە: (**ئیحتیمالی** هەیە بچمە شار) [ف] اِحْتِمال.

**ئیحـرام:** خاولی‌و فوتەی حاجیان کە لە وەختی حەج کردنا بە خۆیانەو دەگرن [ف] اِحرام.

**ئیحیا:** بوُژان، وەگورد کەوتن: (بـەو یارمەتیەت **ئیحیات** کردومەوە، ئەم مەزرایە خۆم **ئیحیام** کردۆتـــەوە، زۆر کزو کەنـەفت بو ئێستـا **ئیحیا** بۆتەوە) [ف] اِحیا.

**ئیخ:** چۆك دادانی وشتر: (وشترەکە **ئیخی** خوارد، ئەم وشترە **ئیخ** بدە) [ف] خوابانیدن شُتُر.

**ئیخبار:** خەبەرلێدان، ڕاپۆرت، شەیتانی کردن [ف] گُزارش دادن.

**ئیخبــاریە:** نوسین بوُمیری لە دژی خەڵك، ڕاپۆرت، نامەی شوفارانە، شوفاری نامە [ف] گزارش، راپورت.

**ئێختە:** ١) گون دەرهاتو؛ ٢) داری شینی سەرقرتاو، ئەختە [ف] ١) نگا: ئەختە.

**ئێختــەرمە:** ١) ئەسپی یەدەگ؛ ٢) ئەسپ‌و چەکی تالانی؛ ٣) لاشەی کوژراوی دوژمن [ف] ١) اسبِ یدك؛ ٢) اسب و اسلحهٔ غنیمتی؛ ٣) جسدِ دشمن.

**ئیختیار:** ١) هەڵبژاردن: (لەم دو خوشکانە کامیان **ئیختیار** دەکەی)؛ ٢) پیرو کۆنە ساڵ: (ریشم سپی بو تەواو **ئیختیار** بوم) [ف] ١) انتخاب؛ ٢) پیر و سالخورده.

**ئیختیدار:** ١) توانـایی لەمـاڵ یان لە هێزی لەشدا: (ئێستا هەژارم ئەز **ئیختیدار**ەم نەمـــاوە، **ئیختیداری** کارکـــردنم نیە ئیختیار بوم)؛ ٢) دەسەڵات: (**ئیختیداری** دەوڵەتم نیە) [ف] ١) قدرت مالی یا بدنی؛ ٢)

سُلطه.

**ئیخراج:** وەدەرنان: (وەتمان لەکار **ئیخراج** کراوە) ف اِخراج.

**ئێخستن:** بەعـەرزادان: (دەت **ئێخم**و بەخستن لێخەت نابمەوە، چاکە بکەو دە ئاوی**خە**) ف بر زمین زدن.

**ئێخسیر:** ١) دیل، گراو لەشەڕ؛ ٢) هەژارو جێگەی بەزەیی ف ١) اسیر؛ ٢) بینوا.

**ئیخفال:** فریو، دەس خەرۆیی، هەڵخەڵەتاندن، دەس خەڕەیی ف اِغفال.

**ئیخلاس:** دڵپاکی، ئەمەگ: (پیرۆت بە **ئیخلاس** کار دەکا، بۆ گەورەی خۆی بەئیخلاسە) ف اِخلاص.

**ئێد:** ئەمە، ئەم ف این.

**ئیدارە:** ١) دەزگای دەوڵەت؛ ٢) باش پێ ڕاگەیشتن: (ماڵاتی زۆری هەیە پێی ئیدارە ناکرێ) ف ١) ادارە؛ ٢) ادارە کردن.

**ئیدعا:** داوا ف اِدّعا.

**ئێدن:** هی‌دی، دوبارە، هی‌دیکە ف دوبارە، ایضاً.

**ئیدی:** ١) جارێکی‌تر: (**ئیدی** مەیە ماڵمـان)؛ ٢) هیتـرت: (ئەوەی دیتم باشە **ئیدیت** هەیە؟) ف ١) بار دیگر؛ ٢) دیگر هم.

**ئیدیکە:** ئیدی ف نگا: ئیدی.

**ئێر:** ئاگر، ئاور ف آتش.

**ئێرا:** ئەم جێگە، ئێرە، بەرانبەری ئەوێ ف اینجا.

**ئیراد:** ١) داهاتی ساڵ: ٢) رەخنەگرتن ف ١) واردات: ٢) ایراد.

**ئیرادە:** خواست، لێ‌بڕان ف اِرادە.

**ئێراق:** بەربەڕۆچکە، جێگەی خۆهەڵخستن لە بەر تاو ف آفتابگیر.

**ئێران:** وڵاتێکە ف ایران.

**ئێرانە:** ئێرا، ئەم شوێنە، ڤر ف اینجا.

**ئیربار:** قاپ‌و قاچاغی ناوماڵ، هەوڕ: (فاتێ لە سەرکانی **ئیرباران** دەشوا، پوُرە شەم **ئیربار** کەرە) ف ظروف خانگی.

**ئیرس:** کەلەپوُڕ، میرات ف اِرث.

**ئێرڤست:** دارێکی لێرەواری دڕکدارە ف درختی است.

**ئێرمان:** خزمەتکار، نوکەر، بەردەست ف نوکر.

**ئێروُ:** بژیو، تفاق، پێداویستی ماڵ: (پیاو بە **ئێروُ** بێ زستانیش خۆشە) ف وسایل زندگی.

**ئیرۆ:** ئەمڕۆ، ئیمڕۆ ف اِمروز.

**ئێروکانە:** ئێرە، ئەگرە ف همین‌جا.

**ئێروکە:** ئێرە ف درست اینجا.

**ئێرۆهە:** ئەم ڕۆژە، لەم دەمەدا ف اِمروزە.

**ئێرە:** ئەگرە، ڤر ف اینجا.

**ئێرەق:** ١) کێر هەستاو؛ ٢) ڕەپ: (ئەم ئەسپە لەو ماینە **ئێرەق** بوە، بڕوانە ئێرەقی کردوە)؛ ٣) ئاموُر، هەوجاڕی یەکپارچە ف ١) ذَکَر برخاستە؛ ٢) برآمدە؛ ٣) خیش.

**ئێرەقان:** نەخۆشی زەردوُیی ف یَرَقان.

**ئێرەقە:** هەوجاڕی یەکپارچە کە دەندەو باسك پێکەوەن ف خیش.

**ئێرەکانە:** ئێرە ف اینجا.

**ئێرەکانێ:** ئێرە ف اینجا.

**ئێرەکە:** ئێرە ف همینجا.

**ئێرەموُك:** نە نێر نەمی، نێرە موك ف خنثیٰ.

**ئێرەیی:** چاوچنۆکی، بەغیلی، حەسودی ف بُخل و حَسَد.

**ئیزا:** پاداشت، قەرەبو، تۆڵەدانەوە، سزا ف سزا.

**ئیزبار:** روبەڕو ف مُقابل.

**ئیزدەرەم:** سوُرم لەسەری ف حتماً.

**ئیزرایل:** پێمێرد، فرشتەی گیان‌کێشان، مەلکەموت ف عزرائیل.

**ئیزرەم:** کێشانەیەکە لە سەردەشت‌و سولەیمانی بەرانبەر بە نیو کیلۆ ف وزنی است برابر پانصد گرم.

**ئیزن:** مەرەخەستی، ئیجازە ف اجازە و رُخصت.

**ئێزنگ:** داری سوتاندن ف هیزُم.

**ئیزوٚك:** زیپکەی شیری کە لە دەم‌و چاوی منالاّن دێت ف جوش شیری.

**ئێزی:** جوڵانەی گوریسی منالاّن ف تاب.

**ئێزینگ:** ئێزنگ ف هیزُم.

**ئیژگڵ:** پۆلو، پەرەنگ، سکڵ ف اَخگر.

**ئیسا:** ١) ئێستا، نوُکە، نهۆ؛ ٢) ئایسا، پێ‌بو، داگیرسا، داگرسیا؛ ٣) عیسا ف ١) اکنون؛ ٢) شعلەور شُد؛ ٣) عیسیٰ.

**ئیساکە:** هەرئێستە ف هم‌اکنون.

**ئیساکێ:** ئیساکە ف هم‌اکنون.

**ئیسال:** ئیمساڵ ف اِمسال.

**ئیست:** پشـوُ، وچـانێکی کەم: (لێرە ئیستێك بگرین بحەسێینەوە) ف استراحتِ کَم.

**ئیستا:** نهۆ، نوُکە، ئەلعان ف اکنون.

**ئێستا:** ئیستا ف اکنون.

**ئێستاکانێ:** ئیستا ف اکنون.

**ئێستاکونێ:** هەرنهۆ ف همین حالا.

**ئێستاکە:** ئێستا ف اکنون.

**ئیستاکێ:** ئیستا ف اکنون.

**ئێستر:** قانتر، داك ماینی کەرباب، هێستر، هێسر ف اَستَر.

**ئێستر بالاّنی:** قاتری داك گوێرێژی باوك ئەسپ ف اَستَر پدر اسب.

**ئێستك:** ئیسقان، ئێسك، پێشە، هەستی ف اُستخوان.

**ئیستە:** ئیستا ف اکنون.

**ئێستە:** ئێستا ف اکنون.

**ئێستەکانێ:** هەرئیستا ف هم‌اکنون.

**ئێستەکە:** ئێستا ف اکنون.

**ئیستەکوُنێ:** هەرئیستا ف هم‌اکنون.

**ئیستەکێ:** ئێستە ف اکنون.

**ئیستێ:** ئیستا ف اکنون.

**ئیستیراحەت:** حەسانەوە، وچان‌دان، ئاسودەیی ف اِستراحت.

**ئیستیکان:** پیاڵەی چای خواردنەوە ف اِستکان.

**ئێستێکانێ:** ئیستا ف اکنون.

**ئیسحال:** زگەشۆرە، سەرپێیی، بەلەفیرە، زگچوُن، رەوانی، تەقەفیرە ف اِسهال.
**ئیسخوان:** ئێستك ف اُستخوان.
**ئیسر:** گوشینگە، شوێنی گوشینی ترێو میوەی‌تر ف عصاری.
**ئیسراحەت:** ئاسودەیی ف اِستراحت.
**ئیسقان:** ئێستك ف اُستخوان.
**ئێسقان:** ئێستك ف استخوان.
**ئیسقایی:** نەخۆشی ئاوبەند ف مرض استسقا.
**ئیسك:** نزگەرە ف سِکْسکه.
**ئێسك:** ئێستك ف اُستخوان.
**ئیسکان:** ئیستیکان ف استکان.
**ئێسك‌سوُك:** رەزاسوُك، خوێن‌شیرین، روح‌سوُك ف دوست‌داشتنی.
**ئێسك‌قورس:** خوێنتاڵ، رەزاگران، کرێت ف بدأخم.
**ئێسك‌گران:** رەزاگران، بەرابەری ئێسك‌سوك ف نامحبوب.
**ئێسکوپروسك:** نیوە رزیوی لاشی مردو ف پوسیدهٔ جَسَد در گور.
**ئیسکە:** نزگەرە ف سِکْسکه.
**ئیسلام:** ١) دینی مُحمَّد(ص)؛ ٢) موسوڵمان ف ١) اسلام؛ ٢) مسلمان.
**ئیسلامەتی:** موسوڵمانەتی، ئیسلام ف مسلمانی.
**ئیسم:** ناو، نێو: («ئیسمی عەزەم» دوعای هەرە بەبیت) ف اسم.
**ئیسۆت:** بیباری رەش، ئیسیوەت، فلفل ف فلفل سیاه.
**ئیسهاڵ:** ئیسحال ف اِسهال.
**ئیسیوەت:** ئیسۆت ف فلفل سیاه.
**ئیش:** ١) وشـەی پارێز لە پیسی، قخ، پیسـە؛ ٢) کارو فرمـان؛ ٣) زللە لەپاش مل ف ١) کلمهٔ تحذیر؛ ٢) کار؛ ٣) پَس گردنی.
**ئێش:** ئازار، ژان ف درد.
**ئیشار:** جۆرێ سەرپۆشی ژنانە کە شانو پیل دەگرێ، چارۆکە، کۆڵوانە ف نوعی سرپوش زنانه.
**ئیشاعە:** دەنگ داکەوتن بە درۆ ف شایعه.
**ئیشاڵلا:** خوا حەزکا، حەز دەکەم ف انشاءالله.
**ئێشـاگـران:** کەوتویی، گرانەتا، گرانەتێ، نەخۆشیەکی گیرۆیە ئەسپێ رایدە گوێزێ ف تیفوس.
**ئێشان:** ژان، ئازار، بەئازار ف درد، آزار.
**ئێشای:** ئێشان، ژان ف درد، آزار.
**ئیشت:** شەپەزلەی پشت‌مل، عیشت ف پَس گردنی.
**ئیشتیا:** واز، کەیف، ئارەزو، هەوەس ف اشتها.
**ئیشق:** ئەڤین، دڵداری، عیشق ف عشق.
**ئیشقلکێ:** هەنگڵە شەلە، لەسەر یەك‌پا رۆیشتن ف لی لی.
**ئیشك:** ١) وشك، زوها، بەرانبەری تەڕ؛ ٢) رەقو سەخت، دژی نەرم ف ١) خُشك؛ ٢) سِفت.
**ئێشـك:** ١) هێچك، ئاڵقەداری سەر گوریسو کەژو؛ ٢) کێشك، پاس: (ئەمشەو من **ئێشك** دەکێشم، تۆ **ئێشك** بگرە) ف ١) حلقهٔ باربند؛ ٢) کشیك.

**ئیشکارۆ:** بیاوانی بێ‌ئاو، بێروُن ف بیابان بی‌آب.
**ئیشکال:** چەتون، دژوار، زەحمەت ف مُشکل.
**ئیشکانی:** ١) بەژ، بەرانبەری دەریا؛ ٢) زەوینی پەنا ئاو ف ١) بَرّ؛ ٢) خُشکیِ نزدیك به آب.
**ئیشکـاو:** دواچـوڕی ئاو: (گۆلـەکـە **ئیشکاوی** هات، **ئیشکاو** هاتن، **ئیشکاو** داهاتن: دوا چوڕ لێ بڕان) ف خوشیدنِ چشمه یا استخر.
**ئیشکاوز:** تۆی بەوشکیەوە کراو، خەفتان ف کاشتن قبل از باران.
**ئیشکاوس:** ئیشکاوز ف کاشتن قبل از باران.
**ئیشکایی:** وشکیایەتی، ئیشکانی ف خُشکی.
**ئیشك‌بون:** ١) لەتەڕی قوتاربون؛ ٢) بێ جوڵان لە شوێندا قەتیس: (لە عەیبەتان هەر لە جێی خۆم **ئیشك‌بوم**) ف ١) و ٢) خُشك شُدن.
**ئیشك‌بونەوە:** لە تەڕی رزگاربون ف خُشك شدن.
**ئێشـك‌چی:** پاسـدەری شەوانـە، جەزایەرچی، («**ئێشـك‌چیەتی**»: پاسدەری) ف نگهبان.
**ئێشکـدان:** ١) شەتـەکـدان، توندبەستن، جیرەبابە؛ ٢) ئێشك‌کێشان، جەزایەرچیەتی ف ١) مُحکم بستن؛ ٢) نگهبانی.
**ئیشك کردن:** ١) لە تەڕی رزگار کردن؛ ٢) لە شیردان وەستانیِ شیردەر: (چێڵەکەمان **ئیشکی کرد**) ف ١) خشك کردن؛ ٢) خُشك شُدنِ شیرِ حیوانِ شیرده.
**ئیشك کردنەوە:** لەتەڕی خەلاس کردن ف خُشك کردن.
**ئێشك‌گر:** پاسەوانی شەو، جەزایەرچی ف نگهبان.
**ئێشك‌گرتن:** پاسداری ف نگهبانی.
ئیشك‌و برینگ: تەواو وشك، وشك‌و برینگ ف تمام خُشك.
**ئیشکـە:** ١) کۆن‌دۆ، ئاژەڵێ کە نەزابیو شیر بدا، ئیشکەدۆ؛ ٢) پارەی نەغد لە ماڵدا ف ١) گاوی که بچه نیاورده شیر بدهد؛ ٢) نقدینه.
**ئیشکەبەرد:** دیواری بەبەرد هەڵچناوی بێ‌قوڕ، وشکە کەڵەك ف دیوار سنگی.
**ئیشکەدۆ:** ئیشکە، کۆن‌دۆ ف نگا: ئیشکه.
**ئیشکەر:** کارکەر، ئەوکەسەی کار دەکا، بەکار ف کارگر.
**ئیشکـەڕن:** ١) مو رنین لە کەوڵی ئاژەڵ؛ ٢) گاڵتـەجـاڕی گەمـەی تەنافبازی ف ١) چیدن کُرك از پوستِ حیوانات؛ ٢) دلقك.
**ئیشکـەڕۆ:** ١) یەکسمی فێرەرەوت نەکراو؛ ٢) چۆمێ کە هاوین وشك دەکا ف ١) اسب تعلیم ندیده؛ ٢) رودخانه‌ای که در تابستان می‌خُشکد.
**ئیشکەساڵ:** ساڵی کەم‌باران ف خُشکسال.
**ئیشکەسۆفی:** خودا خوازی هیچ نەزان ف زاهدِ اَبله.
**ئیشکەسەرما:** سەرمای سەختی بێ‌بەفر ف سرمای سخت بدون برف.
**ئیشکە کەڵەك:** ئیشکەبەرد ف دیوار سنگی.
**ئیشکەڵ:** وشکە لقو چرۆ کە بۆ سوُتان دەبێ، چڕوچیلکە ف هیمه.
**ئیشکەڵوا:** هەڵوای دۆشاو کەبۆ سەفەری دەبەن ف نوعی حلوا برای مُسافرت.
**ئیشکەمز:** کرێی نەغد بەبێ خواردن دان بە کرێکار ف مُزد بی‌خوراك.

**ئیشکەمس:** ئیشکەمز ف مُزد بدون خوراك.

**ئیشك هەڵاتن:** ١) لەخۆوە وشك‌بون؛ ٢) لە خەم‌و خەفەتان کزبون ف ١) خُشك شدن بطور طبیعی؛ ٢) ضعیف شدن از غم و غصه.

**ئیشك هەڵێنان:** ١) بە تەقالا وشك کردن؛ ٢) خەم‌دان بەکەسێك‌و لاواز کردنی ف ١) خُشك گردانیدن؛ ٢) کسی را غصه‌دار کردن.

**ئیشکێڵ:** ١) لاولاوی دارین، پارچــە تەختــەیەکی سێ‌سوچــە کە پەنجــەرەی پێ قایم دەکــەن، زمــانە؛ ٢) شەیتانۆکە، سەدەفۆکەیەکی سپی وەك گوێ ماسیلکــە بەهاران پاش باران دەزێتەوە ف ١) چوبك پنجره‌بَند؛ ٢) حَلَزون.

**ئیشلك:** جۆرێ کەوا، کورتەك، کورتە ف نوعی قبای مردانه.

**ئیشلەك:** سوخمە، یەلەك ف یَلَك.

**ئیشەڤ:** ئەم‌شەو ف اِمشب.

**ئێع:** وشەی قێزوبێز: («ئێع! چپیسە!»: بێزم هەستا) ف کلمهٔ ابراز تهوع و دل بهم آمدن.

**ئیعان:** ئیستە ف اکنون.

**ئیعانە:** باربو، یارمەتی، پیتاك ف اِعانه.

**ئیعدام:** کوژران یان خنکان لەلایەن دەوڵەتەوە ف اِعدام.

**ئیغباڵ:** بەخت، تالح، تاڵە، ئیقباڵ ف شانس و اقبال.

**ئیغدام:** غیرەت، نەترسان، بوێری ف شجاعت و بیباکی.

**ئیف:** ١) ئای چباشە؛ ٢) فێ، نەخۆشی خوُداری: («**ئیفدار**»: فێدار) ف ١) کلمهٔ تحسین بەمعنی بەبە؛ ٢) صرع.

**ئیفــادە:** ١) دەعیە، فیز؛ ٢) لێ‌پرسین‌و جواب دانــەوە ف ١) اِفاده؛ ٢) سؤال و جواب.

**ئیفتــادە:** پیری لەکــار کەوتــە: (ئــەی تازەجــوان پیر بی کە **ئیفتادەم**و کەوتوم) «نالی» ف پیر و از کار افتاده.

**ئیفتار:** بەربانگ،ڕۆژو کردنەوە ف اِفطار.

**ئیفتیخار:** شانازی، خۆ پێوە هەڵدان ف اِفتخار.

**ئیفتیرا:** بوختان ف بُهتان.

**ئیفلاس:** نابوُتی، ماڵی دنیا نەمان، مزمەعیل ف ورشکستگی.

**ئیفلیج:** شەپڵە، شەپڵە لێدراو: («**ئیفلیجی**»: نەخۆشی شەپڵە) ف فَلَج.

**ئێقلاب:** بەرکوت، بەر لە خەرمان کەمێ گەنم کوتان بۆ نانی پێداویست ف پیشکوب خَرمَن.

**ئیقلیم:** وڵات، مەڵبەند، ناوچە ف اِقلیم.

**ئیقناع:** هێنانە سەربار، رازی کردن، تاوکردن ف راضی کردن.

**ئێك:** یەك، نیمەی دو ف یك.

**ئێکانە:** نێرەبەراز، یەکانە ف گُراز نر.

**ئێکاوئێك:** دەرمان یا نوشتەی زۆرکاری: (نوشتەی من بۆ تا **ئێکاوئێکە**، ئەم دەرمانە **ئێکاوئێکە**) ف داروی مؤثر.

**ئێکجار:** ئێجگار ف بسیار.

**ئێکجارەکی:** ئێجگارەکی ف یکباره.

**ئێکجاری:** ئێجگاری ف یکباره.

**ئیکلام:** کڕنوش، سەرچەماندن بۆ ڕێزگرتن: («**ئیکلام کردن**»، «**ئیکلام** کێشان») ف تعظیم.

**ئیکمــال:** کرچــە ئەزمــون، ئەزمــونی نیوەچــڵ، ئەو شاگردەی لەچەند دەرسێك دەر نەچوەو دەبێ سەر لەنوێ پایز بی‌ئەزمون ف تجدیدی.

**ئیکو:** چلۆن، چۆن، چاوا: (**ئیکوی**؟ باشی؟)، («**ئیکوە**: چلۆنە؟») ف چطور.

**ئیکە:** هیتر، یادن، ئیدیکە ف دیگری.

**ئێگجار:** ئێجگار ف بسیار.

**ئێگجارەکی:** ئێجگارەکی ف بەیکبارە.

**ئێگجاری:** ئێجگاری ف یکبارگی.

**ئێگر:** ئاگر، ئاور ف آتش.

**ئیگــرەم:** کێشــانــەیەکــە بەرانبەر بە دوسەد گرام ف وزنی است معادل دویست گرم.

**ئیگل:** ئەمجارە، جارێکی‌تر ف این‌بار.

**ئێگە:** لێرە، لەتەگرە، لڤر، ئێرە ف اینجا.

**ئێل:** خێڵ، کۆمەڵە کۆچەرێك پێکەوە، عێل ف ایل.

**ئێلات:** ڕەوەند، ئەوانەی دەچنە بانەمەڕ ف ایلات.

**ئێلاخ:** زۆزان، هەوار، هاوینەوار، ئێلاخ ف ییلاق.

**ئێڤار:** ئێوارە، ئەنگۆرێ، عەسر، حەسر ف دَمِ غروب.

**ئێق:** ١) هێڵنج، دڵ شێوان، پێشایی ڕشانەوە؛ ٢) کشانەوی ئاو یا خەڵك لەبــەر زۆری‌و بێ دەرەتــانی: (ئــاوەکــە پێشی گیرابــو **ئێقی** دایەوە، حەشامات هێند زۆرەو پێشی نارۆا **ئێقی** کردۆتەوە)؛ ٣) نم‌کێشان ف ١) حالت تهوع؛ ٢) عقب کشیدن آب یا جمعیت بەدلیل ازدحام؛ ٣) نم‌کشیدن.

**ئیقامەت:** قامەت، دوعای پێش‌نوێژی جەماعەت ف دعای قبل از نماز جماعت.

**ئیقباڵ:** ئیغباڵ، تاڵە، بەخت ف اِقبال.

**ئیقدام:** ئیغدام ف اِقدام.

**ئیقرار:** درکاندن، ڕاستی گوتن ف اِقرار.

**ئیقل:** هەر ئەوەندوکە، هەر ئەوتۆزە ف همین یك ذرّه.

**ئیلاقە:** ١) پەیوەندی، ئاشنایی؛ ٢) گانی نارەوا: (لەسەر فلانەیان گرتوە، دەڵێن **ئیلاقەی** کردوە) ف ١) علاقه و پیوند؛ ٢) تعرّض به ناموس.

**ئیلان:** ١) پاشگــری گچکــەیی: (بــا**بیلان**)؛ ٢) هێلانــە ف ١) پسوند تصغیر؛ ٢) آشیانه.

**ئیلتیفــات:** لاواندنەوە، ڕوخۆشی، ئاوڕ وێدانەوە: (ئاغا دەگەڵما زۆر بە **ئیلتیفات بو**) ف التفات.

**ئێلجاڕ:** گەلەکۆمەگی، زۆر کەسی خزم لە شتێك یا لە کەسێك کۆ بونەوە: (من تەنیا بوم ئەوانیش **ئێلجــاڕی**یان لێکــردم دەرۆستیان نەهاتم) ف همکاری گروهی.

**ئێلدە:** دەگەڵ بێلدە دەگوترێ، پازدە ڕۆژی هەرەسەرمای زستان ف پانزده روز اوج سرمای زمستان.

**ئیللا:** ١) جگــە، بل، غەیرەز؛ ٢) وشــەی سوُربون‌و پێ‌داگرتن: (بڵێن نەڵێن **ئیللا** هەر دەچم)؛ ٣) لەسەر پشت کەوتنی میچ، چکە لەجۆرێ

قاپێن دا دەڵێن ف ١) بغیر از؛ ٢) حرف اصرار؛ ٣) بر پُشت افتادن شتالنگ.

**ئیللان و بیللان:** پێداگریو سوربـون: (له ماڵدا غەزریوە **ئیللان و بیللان** دەر ناکەوێ) ف حرف اصرار و پافشاری.

**ئیللا و بیللا:** ئیللان و بیللان ف حرف اصرار و پافشاری.

**ئیلکـه:** پاشگـری چوك شانـدانـه: (**ساویلکه، کانیلکه، گۆمیلکه، جامیلکه**) ف پسوند تصغیر.

**ئیله:** پاشگری گچکەیی: ( **بابیله، کاکیله**) ف آلت تصغیر.

**ئێلەك:** هێلەگ، ئامرازی ئارد پێژان، مۆخڵ ف اَلَك، مو بیز.

**ئێلەگ:** سوخمه، یەلەك ف یَلَك.

**ئێلەگ:** ئێلەگ، سوخمه ف یَلَك.

**ئیلێ:** پاشگـر بۆ ناوی مێوینەی نازدار: (**خەجیلێ فاتیلێ**) ف پسوند، علامت محبت برای مؤنث.

**ئیلیان:** هێلان، هێلین، هێلانه، ماڵی مەل ف آشیانه.

**ئێم:** ئالکی یەکسم ف علیق ستور.

**ئیم:** ١) ئێم؛ ٢) ئەم: (**ئیمرۆ، ئیمساڵ**) ف ١) علیق ستور؛ ٢) این.

**ئیما:** هێما، عاشیرەت وە چەم یا وە دەس: (**به ئیمای** دیدەیی مەعشوقە عاشق کێو لەبن دێنێ / له لای «سالم» کەنندەی بێستون موژگانی شیرین بو) «سالم» ف اِشاره.

**ئیمـام:** ١) سەرداری ئاینی؛ ٢) پێش نوێژ؛ ٣) دەنکـه هەرە درێژەکـەی تەزبێح ف ١) اِمام؛ ٢) پیش‌نماز؛ ٣) درشت‌ترین دانه تسبیح.

**ئیمامه:** دەنکه درێژەکەی تەزبێح ف درشت‌ترین دانۀ تسبیح.

**ئیمامەتی:** پێش نوێژی ف پیشنمازی.

**ئیمان:** بڕوا، باوەڕی، ئتقات: (**ئیماندار**: خاوەن باوەڕ) ف ایمان.

**ئیمتیحان:** ئەزمون، تاقی کردنەوە ف امتحان.

**ئیمجا:** ئەمجار ف این‌بار.

**ئیمجار:** ئیمجا ف این‌بار.

**ئیمچون:** هەرچوار پەل، دەستو پا: (**خڕمچون** ناڵم‌کرد) ف هر چهار دست و پا.

**ئیمڕۆ:** ڕۆژێ که تیاین ف اِمروز.

**ئیمزا:** ناوی نوسراو لەبن نامەو قەباڵەو ... ف امضا.

**ئیمساڵ:** ئەمساڵ ف اِمسال.

**ئیمشەو:** ئەمشەو ف اِمشب.

**ئیمکان:** ١) لەکردن هاتو: (**مومکن**: شیاوی وەدی هاتن)؛ ٢) توانایی‌و هێز: (له **ئیمکانمدا نیه**) ف ١) و ٢) اِمکان.

**ئیملا:** نوسینەوەی وتەی خەڵك ف اِملا.

**ئێمه:** من‌و خەڵکی‌تر، ئەم، مە ف ما.

**ئیمه:** ئێمه ف ما.

**ئێمەگەل:** ئێمه ف ما.

**ئێمەمانان:** من‌و کەسانی وەك من له ژیاندا ف مَن و أمثال مَن.

**ئێمەنی:** جۆرێك کەوشی سوُری بێپاژنەی پیاوانه ف نوعی کفش مردانه.

**ئێمەومانان:** ئێمەمانان ف نگا: ئێمەمانان.

**ئێن:** ١) پاشگـرێکـه بەدوای گاڵتـەو قومـاردا دێت: (**نەردێن، جگێن، مێشێن، تۆپێن**)؛ ٢) خەبـەر دانی هاتنی کۆیه: (ئـەمڕۆ **ئێن** بۆماڵی ئێمه) ف ١) پسوند بەمعنی بازی؛ ٢) می‌آیند.

**ئین:** ١) هەینی، هەینو، جومعه؛ ٢) پاشگری پەسنه: (**شیرین، ڕەنگین، زێوین**)؛ ٣) درۆشمی چاوگه: (**گرین، کولین، کڕین**) ف ١) جمعه؛ ٢) پسوند توصیف؛ ٣) علامت مصدر.

**ئینا:** کاری رابردوه، هێنای، هاوردی، ئانی ف آورد.

**ئینات:** لاساری ف بدرفتاری.

**ئینان:** ١) هاوردن، هێنان، ئانین؛ ٢) باوەڕ، متمانه: (**ئینان** بکه من ماڵی تۆم نەدزیوە) ف ١) آوردن؛ ٢) باوَر.

**ئینتەلا:** نەخۆشی گرفت که له ئەزم نەکردنی خواردنەوە توشی دەبن ف بیماری امتلاءِ.

**ئینتیحام:** ئەزمون ف اِمتحان.

**ئینتیخابات:** هەڵبژاردنی بریکار له دەوڵەتا ف اِنتخابات.

**ئینتیزار:** ١) چاوەنۆڕی، چەمەڕایی؛ ٢) چاوەنۆڕ، چەمەڕا ف ١) انتظار؛ ٢) مُنتظر.

**ئینتیقام:** تۆڵه، حەیف، تۆڵ ف اِنتقام.

**ئینج:** بەشێك له دوازده بەشی پێ ف اِینج.

**ئینجا:** ١) کەوایه، کەوابو؛ ٢) ئەمجار ف ١) که این‌طور؛ ٢) این‌بار.

**ئینجار:** کەواتا، کەوابو ف پس.

**ئینجارەکانی:** ئینجار ف پس.

**ئینجارەکێ:** ئینجار ف پس.

**ئینجاکو:** ئینجار ف پس.

**ئینجاکونێ:** ئینجار ف پس.

**ئینجانه:** دەفری گڵین بۆ گوڵ تێدا چاندن، گوڵدان ف گُلدان سُفالی.

**ئینجـه:** دەگەڵ فینجـەی دەڵێن: فیزو خۆ بەزل زانین: (کـاورایەکی **بەئینجەو فینجەیه**) ف فیس و افاده.

**ئینجەت:** ئەنجەت، بەهانه ف بهانه.

**ئینساف:** پیاوەتی، ویژدان، هەقانیەت ف اِنصاف.

**ئینسان:** حیسان، عیسان، مرۆ ف اِنسان.

**ئینسانەتی:** پیاوەتی، جوامێری، بەزەیی ف انسانیّت.

**ئینشا:** یەیداکردنی وشەو رستی جوان بۆ نوُسین ف اِنشا.

**ئینشابەند:** کەسێ ئینشای باشه، مونشی ف منشی.

**ئینقیلاب:** شۆڕش، هەڵگەڕاندنەوەی دەزگای دەوڵەت ف اِنقلاب...

**ئینکار:** ١) دان پێدا نەهێنان، نەدرکاندنی ڕاستی، حاشا؛ ٢) حاشاکەر، بێباوەڕ بەڕاستی ف ١) انکار؛ ٢) منکر.

**ئینکاری:** پیاوی ئینکار کەر، حاشاکەر ف مُنکر.

**ئینکەبەری:** لاساری، گوێ نەبیسی ف لجبازی.

**ئینکێری:** ئینکاری، ئینکار ف اِنکار.

**ئێنه:** پاشگرێکه پەسن دەکاته ناو: (**زەردێنه، سپێنه، نیسکێنه، ماشێنه**) ف پسوندی صفت را بەاسم تبدیل کند.

**ئینـه:** ۱) ئەوانـە، ئەمانە، یانە؛ ۲) ئەمە، ئەم یەکە؛ ۳) پاشگری گاسی کردن: (کورێنه وەرن)، (کوردینه تاکەی ئێمە لەکێوان میسالی دێو / دێین و دەچین و بوٚمە نەبێ قەت خودان و خێو) «سەیف»؛ ۴) پاشگری بەسن: (کوٚلکە زێڕێنە، شێرە بەفرینە) ف ۱) آنها؛ ۲) این؛ ۳) پسوند ندا؛ ۴) پسوند توصیف.

**ئینەشا:** ئەوەتانێ، ئائەوەیان ف همین است.

**ئێو:** جوٚ، دەغڵی ئاموٚزای گەنم، جە ف جَو.

**ئێوار:** دەمی عەسر، ئێڤار ف عصر.

**ئێوارە:** ۱) ئێوار؛ ۲) تاریکان، وێرەگا ف ۱) عصر؛ ۲) تنگِ غروب.

**ئێواش:** لەسەرخوٚ، سەبر، هێواش، بەئەسپایی ف یواش.

**ئێوە:** ۱) توٚ لەگەڵ کەس یا کەسانی تر، هون، ئەنگوٚ، هنگ؛ ۲) پیاوی بێ‌ژن، ژنی بێ‌مێرد ف ۱) شما؛ ۲) بیوه.

**ئێوەت:** بەخێو کردن، ئاگاداری کردن، سەرپەرشتی ف سَرپَرستی.

**ئیە:** ئەمە، ئەیە ف این.

**ئیەتی:** پاشگری جوٚنیەتی: (برسیەتی، ژنیەتی، تێریەتی) ف پسوند حالت.

**ئێهێ:** ۱) بەڵێ بەڵێ؛ ۲) بوٚ گازی: (ئێهێ فلان وەرەوە) ف ۱) بلی بلی؛ ۲) کلمهٔ ندا.

**ب:** *لەپێشەوە بێ چەند واتا دەدات* : ١) فەرمان: (بخوێنەوە، برۆ)؛ ٢) بلا، قەی ناکـا: (دەچی؟ بچۆ، دەشۆ ی؟ بشۆ)؛ ٣) ئەگەر: (بباریبا خۆش بو، بچــیە شار کارم هەیە)؛ ۴) ئامــراز: (بلوێر، بلوور: ئامــرازی لۆرانـدنـەوە)؛ ۵) کارکەر: (بگێڕ، بخۆر، بکوژ) ف بەعنوان *پیشوند بەچند معنی می‌آید:* ١) امری؛ ٢) مانعی ندارد؛ ٣) اگر؛ ۴) علامت ابزار؛ ۵) علامت فاعلی.

**با:** بەڵێ، ئارێ، لە وەرامی پرسیارێ کە «نای» تێدا بێ: (تۆ نەچوی؛ **با**، مووچەت وەر نەگرت؛ **با**)؛ ٢) لێگەرێ، بهێڵە: (با بچێ، با بخوا)؛ ٣) گریمان کرد: (با بچو بای خۆ نەدەمردی)؛ ۴) بزوتنەوەی توندی هەوا: (بـای شەماڵ)؛ ۵) ئارەزوی هێندێ جانەوەری مێچکە بۆ نێر: (دێڵە بەبـا، پشیلەکە وەبا هاتوە کە ئەم وشەیە لەناو عەرەب بویتە «**باه**»و بە وزەی گان کردن دەڵێن)؛ ۶) لەکن، لجەم، لنك: (کالکێ من با تەیە، تز بیاتـە بامنـە)؛ ٧) نەخـۆشیو ژانێکی نادیاری لەشە: (کاورا با دارە دەچــێتــە سەر چاکــیبا، مەلاش بای بۆ بڕیوە)؛ ٨) بریەتـیە لە هەڵمسانی زگ: (زگم بای کردوە)؛ ٩) بریەتیە لە تڕو تس: (مناڵەکە بای لێ دەبێتەوە)؛ ١٠) پێچدان: (ئەو بەنە با دراوە)؛ ١١) ئەستوربونی لەش: (دەستم بای کردوە)؛ ١٢) بانگ کردن: (حەسۆباکرە ژناخۆ) ف ١) آری؛ ٢) بگذار؛ ٣) گیرم؛ ۴) باد؛ ۵) باه؛ ۶) نزد؛ ٧) رُماتیسم مفصلی؛ ٨) آمــاسیدن شکم؛ ٩) بادِ شکم؛ ١٠) تاب؛ ١١) آمـاس اندام؛ ١٢) صدا زدن.

**بالم:** بادام، بەهیف، باوی، چواله ف بادام.

**بائەنگێو:** کونەبا، قەڵشتێك یا کونێ کە بای لێوە دێ ف مَنْفَذِ باد.

**باب:** ١) باوك، باف؛ ٢) شیاو، رەوا: (ئەم کارە **بابی** تۆ نیە)؛ ٣) باو، داب: (ریش تاشین قەدیم **باب** نەبـو)؛ ۴) بەشێك لە کتێب ف ١) پدر؛ ٢) لایق؛ ٣) مُد؛ ۴) قسمی از کتاب.

**بابا:** ١) بەڵێ بەڵێ: (هەر ناچی؟ **بابا** دەچم)؛ ٢) کەسی بێ‌ناو: (**بابایەکی** وەك من قەلەندەر)؛ ٣) ناوی باوك بەریزەوە هێنان؛ ۴) باپیر ف ١) آری آری؛ ٢) شخص گُمنام؛ ٣) با احترام اسم از پدر بردن؛ ۴) پدربُزرگ.

**بابـان:** ماڵـەبـاب: (بـابانت شێوێ)؛ ٢) مەڵبەندو هۆزێك لەشارەزوورو ئەردەلان ف ١) خانۀ پدری؛ ٢) منطقه و عشیرتی در شهر زوروکردستان.

**بابـڕ:** ١) سوێلی قەوی، سمێلی ئەستـورو فش: (سمێل بابـڕ بەکەیفی خۆت سمێلی خۆتی لێ‌بادە) «مــەلا مارف»؛ ٢) بانو دیوارێك باش سواخ درابێو بابوێری نەمابێ: (وام دادا بابڕبوە) ف ١) سبیلِ کُلفت؛ ٢) بامِ خوب اندوده.

**بابردە:** ١) بابردو، بەفیرۆچو؛ ٢) تەواو روتو نەدار ف ١) بر باد رفته؛ ٢) مُفلس.

**بابردەڵە:** پوشو قانگەلاشکی بەربا ف گیاه بادبُرده.

**بابردی:** جۆرێ پارچەی بەرگی ژنانە ف نوعی پارچۀ لباس زنان.

**بابلەکانێ:** جۆرێك هەڵپەرکێیە ف نوعی رقص.

**بابلیچـك:** پەنجـە تۆتە، تلیا گچکە، قامکە چکۆڵە، ئەنگوسە توتەلە ف انگشت خنصر.

**بابلیسك:** گێژەڵۆکە، شایی جندۆکان، گەردەلول، باهۆز ف گردباد.

**بابن:** گوڵە بەیبونە، بەیبون ف گُلی بسیار خوشبو.

**بابنۆکەر:** خولامی شەڕکەر، چەکداری ئاغاو خان ف نوکر مسلّح خان.

**بابۆ:** ١) وشەی رێزلێ نانو گازیکردنی باب؛ ٢) هەستی توڵە ف ١) کلمۀ احترام برای خطاب پدر؛ ٢) حسّ انتقامجوئی.

**بابوباپیر:** ئەژدا، باڤو کال ف نیاکان.

**بابوتان:** گەمەیەکی منالانە ف نوعی بازی بچەها.

**بابوسکە:** سوتو، خۆڵەجگەرەو قاقەزو پەڕۆی سوتاو ف خاکستر سیگار و کاغذ و...

**بابوکال:** بابو باپیر: ئەژدا ف نیاکان.

**بابـۆڵـە:** ١) تیکـەی درێژ؛ ٢) قۆنـداغ بۆ کۆرپـە ساوا تێ پێچان؛ ٣) گرۆڤـەری ئەستـور: (ئەوە **بابۆڵەی** باسکیەتی) ف ١) ساندویچ؛ ٢) قنداق؛ ٣) استوانه‌ای قطور.

**بابۆڵەپێچ:** ١) بەنی بابۆڵەی منال؛ ٢) منالی لەبابۆڵەوە پێچراو ف ١) بند قُنداق؛ ٢) کودك در قنداق پیچیده.

**بابوُنه:** گولّه بابوُنه، گیایه‌که سه‌ره‌به‌هاران ده‌ردیّ وگولّێکی سپی ده‌کا [ف] از گُلهای بهاری.

**بابوێر:** کون یا قه‌لّشتی له خانوُدا که بای پێدا دیّ [ف] منفذ باد در دیوار.

**بابه:** بابوّ [ف] نگا: بابوّ.

**بابه‌ت:** ۱) ته‌رحی کوُتالّو که‌ل‌و په‌ل: (چه‌رچی ده **بابه‌تی** شت هێناوه)؛ ۲) به‌رانبـه‌ر، له‌بات: (**بابه‌ت** ئه‌م کتێوه چه‌ت پیّ‌بده‌م؟)؛ ۳) ده‌رباره، له‌مه‌ڕ: (له **بابه‌ت** منه‌وه ئه‌دوان)؛ ۴) ره‌وا، شایان: (ئه‌مه **بابه‌تی** توّ نیه) [ف] ۱) کالا؛ ۲) درمقابل ؛ ۳) درباره؛ ۴) شایسته.

**بابه‌ده‌ست:** روت‌و نه‌دار [ف] باد به‌دست، بینوا.

**بابه‌خولیّ:** باوه خولیّ، سوڕ خواردن، باوه سوڕیّ [ف] دور خود چرخیدن.

**بابـه‌عـه‌مـره:** چلّه‌نوّك، گونه‌گێسك، باوا قوّره‌ت، نیو بست، به‌روالّه‌ت منالّی ته‌مه‌ن زوّر [ف] کوتوله.

**بابه‌گه‌وره:** باپیر، کالك، باوکی باوك [ف] پدربزرگ.

**بابه‌لیّ:** باوکه چکوّلّه، بوّ خوّشه‌ویستی ده‌لّێن [ف] لفظ محبت‌آمیز پدرانه.

**بابی:** له‌سه‌ر دینی به‌هایی [ف] بهائی.

**بابی‌بابی:** که‌ری سور، گه‌مه‌یه‌کی منداڵانه‌یه [ف] نوعی بازی بچّه‌ها.

**بابیتانیّ:** له جوّلانه‌ی گوریس نیشتن، دیله‌کانیّ [ف] تاب بازی.

**بابیلان:** وشـه‌ی خوّشـه‌ویستی بوّ دوانـدنی له‌خـوّ گچکـه‌تر [ف] لفظ محبت‌آمیز برای نوازش کوچکتر.

**بابینی:** هه‌لاّمه‌ت، ئالاّمه‌ت، په‌سیو [ف] زُکام.

**بابێنی:** که‌له‌پوُری باوکی مردو، میراتی باب [ف] میراث پدری.

**باپشکێو:** چینچکه سلاّو، قینچکه سلاّو، سیتکه سلاّو، قینچکه سلاّم [ف] گُل‌مُژه.

**باپوسکه:** ۱) بابوسکه، سوتو؛ ۲) کرێوه‌ی به‌فر به باوه [ف] ۱) خاکستر کاغذ و...؛ ۲) کولاك.

**باپوك:** کرێوه‌و توّفی به‌فر که با ئه‌یهێنیّ [ف] کولاك.

**باپه‌ڕ:** ده‌رد له سه‌رماوه، سه‌رما بون [ف] سرماخوردگی.

**باپه‌سیو:** ئه‌نوایه‌ك با نه‌یگرێته‌وه، په‌نابا، باپه‌نا [ف] باد نگیر.

**باپه‌نا:** باپه‌سیو [ف] باد نگیر.

**باپێچ:** ۱) ژان له‌زگ وه‌ستان؛ ۲) شوێنیّ که زوّر باگر بیّ، دژی باپه‌نا [ف] ۱) دل‌پیچه؛ ۲) بادگیر.

**باپێچك:** شه‌ته‌کدان، توند به‌ستن، گوریس پێچ [ف] طناب‌پیچ کردن.

**باپێدان:** بادان، گشت‌کردنی به‌ن‌و شتی‌تر [ف] تاب دادن نخ و...

**باپیر:** بابه‌گه‌وره [ف] پدربزرگ.

**باپیره:** ۱) باپیر؛ ۲) گازیکـردنی باپیر [ف] ۱) پدربـزرگ؛ ۲) کلمـه‌ای خطاب به پدربزرگ.

**باپیری:** جوّریّ هه‌نجیر، توخمه‌ك هه‌ژیر [ف] نوعی انجیر.

**باپیش:** ده‌ردی چاوێشه [ف] چشم‌درد.

**باپێشك:** بای پێش باران [ف] باد قبل از باران.

**باپیڤ:** قسه‌زلی هیچ کاره، خوّهه‌لّکێشی بیّ‌هونه‌ر [ف] لافزن بیکاره.

**باپیڤان:** زمان هه‌لّه‌یی، خوّ هه‌لّکێشانی بیّ‌مانا [ف] بلوف‌زدن.

**باپێو:** ئامرازیّ که لای هاتنی باو توندی‌و سوکی با شان‌ده‌دا [ف] بادسنج.

**بات:** نك ته، جه‌م ته، لای توّ [ف] نزد تو.

**باترزا:** جه‌ژنێکی یه‌زیزیدیانه له زستاندا [ف] از اعیاد یزیدیها.

**باتری:** پیلی چراگازو ترومبیل [ف] باتری.

**باتسکه:** جوّریّ هه‌نجیر که زوتر پێده‌گا [ف] نوعی انجیر.

**باتسمیّ:** جێژنی گه‌وره‌ی یه‌زیدیان [ف] عید بزرگ یزیدیان.

**باتلاّخ:** زه‌لکاو، زه‌ل، زوّنگ، چه‌ق [ف] باتلاق.

**باتلاغ:** باتلاّخ [ف] باتلاق.

**باتمان:** کێشانه‌یه‌که هه‌مبه‌ری شازده کیلوّو نیو، پێوانه [ف] باطمان، پیمانه.

**باتو:** گون، گونگ: (**باتوی** که‌رو باینجانی، له‌نه‌زانی، یه‌ك ده‌زانی) [ف] خایه.

**باتوف:** گیایه‌که گولّی سور ده‌کا [ف] گیاهی است با گل قرمز.

**باتوّم:** قولّه‌داری ده‌ست داروّغه [ف] باطوم.

**باته:** بات، لای‌توّ، له نزیك توّ، لجه‌م ته [ف] نزد تو.

**باته‌قا:** به‌رانبه‌ر له بالاّ یان له کێش‌دا، هه‌مبه‌ر، بارته‌قا [ف] مُقابل.

**باتی:** له‌جێگه‌ی، له‌بری، جیات: (توّ له**باتی** من بچوّ) [ف] به‌جای.

**باتێدان:** ۱) نه‌خوّشی باداری گرتن؛ ۲) به‌دروّ به‌یه‌کێك هه‌لّگوتن‌و له‌خوّ ده‌ربردن [ف] ۱) مُبتلا شُدن به روماتیسم؛ ۲) به دروغ کسی را مغرور کردن.

**باتیزك:** بیّ‌شه‌رم‌و ڕو هه‌لّمالاّو، باتزوّك [ف] بی‌شرم و حیا.

**باتیزوّك:** روگرژی خوّ به‌زل‌زان [ف] اخموی خودپسند.

**باتیسك:** خوشکی ژن، ژن خوشك [ف] خواهر زن.

**باتینك:** خونچه‌ی تازه پشکوتو [ف] غنچهٔ تازه بشکفته.

**باتینوّك:** ره‌به‌نوّك، گولّه مێلاقه، ئالاله، گولاّلّه سوره [ف] آلاله.

**باج:** ۱) پیتاك، خه‌رج، ئه‌و پاره‌ی پیاوی میری له خه‌لّکی ده‌سێنیّ؛ ۲) تاوان، ئه‌و قه‌ره‌بوه‌ی هوّز یان ده‌وله‌تی تیّ‌شکاو به سه‌رکه‌وتوی ده‌دا؛ ۳) بارانه، سه‌رانه؛ ۴) خاوه، ئه‌وه‌ی به‌ملهوڕی ده‌ستێنن [ف] ۱) باج؛ ۲) تاوان؛ ۳) سرانه؛ ۴) باج سبیل.

**باج ئه‌ستێن:** ئه‌وه‌ی باج کوّ ده‌کاته‌وه [ف] باجگیر.

**باجان:** باینجان، باینجانه ره‌شه، بادنجان [ف] بادنجان.

**باجاناسوّر:** ته‌ماته، باینجانه سوره، توّماتێز [ف] گوجه‌فرنگی.

**باج‌سێن:** باج‌ئه‌ستێن [ف] باجگیر.

**باجگر:** باج‌ئه‌ستێن [ف] باجگیر.

**باجگرتن:** بارانه ساندن [ف] باجگیری.

**باجگه:** ئه‌وبنکه‌ی باجگری تێدان [ف] پُست باجگیری.

**باجـوج:** ۱) هه‌والّی ئاجـوج: (یاجـوج ماجـوج)؛ ۲) خه‌لّکی زوّری تێکه‌لّو پێکه‌لّ: (ئای له‌و ئاج‌و **باجوجه**) [ف] ۱) یاجوج؛ ۲) شلوغی و جنجال.

**باجه:** خوشکی گه‌وره [ف] خواهر بزرگ.

**باجه‌وان:** باجگر [ف] باجگیر.

**باجـی:** ۱) خوشـکـی گه‌وره؛ ۲) خوشـکی مێرد، خوشکی شوُ [ف] ۱) خواهر بزرگ؛ ۲) خواهر شوهر.

**باچ:** باج ف باج.

**باچاندن:** خۆ دزینەوە، کوُزوُبون، لە پەنایەکەوە بۆی دەرچون ف دزدکی رفتن، جیم شدن.

**باچك:** ۱) بەلاڵۆکە کێویلە، ئالو باڵوی جەنگەڵی؛ ۲) گەنمەشامی سور، زڕاتی سور ف ۱) آلو بالوی وحشی؛ ۲) ذرّت قرمز.

**باچوُڕە:** قسەی ناماقوڵ ف حرف باورنکردنی.

**باچـەڕێ:** کاڵـەدڕانـە، پاداشتی دز کاتێ ماڵی دزیەتی دەداتەوە ف مُزد برگرداندن مال دُزدی.

**باچیك:** هەرزن، گاڵ ف ارزَن.

**باخ:** دارستانی میوە، رەز، باغ ف باغ، تاکستان.

**باخچە:** بوخچە، باغی چکۆلە، جێی گوڵو سەوزی چاندن ف باغچە.

**باخڵە:** توربێن، خورجی تۆودان، تۆمدان، تۆمەدانە ف تو بره برزگران.

**باخن:** شوێنێك کە بای لێوەدێ، کونەبا ف منفذ باد.

**باخواردن:** گتست بون، پێچ حواردن ف تاب‌خوردن.

**باخۆر:** کەلێنی بچوك کە بای لێوە دێ، بابوێر ف ترك‌و درز دیوار، منفذِ باد.

**باخۆش:** بلندبالاتر، لە سەرتر دەکایەدا ف ماهرتر در بازی.

**باخوێ:** ۱) خودا، خوا؛ ۲) رەفیق، هەواڵ ف ۱) خُدا؛ ۲) دوست.

**باخە:** ۱) باقە، کۆمەڵێك گیا یان دەغڵی پێکەوە بەستراو؛ ۲) دەنگ کەوتو، دەنگ نوساو؛ ۳) جۆرێ نەخۆشی سمی یەکسم ف ۱) بستۀ گیاه؛ ۲) صداگرفته؛ ۳) نوعی بیماری دام.

**باخەڵ:** ۱) بەر، بەرۆك، نێوانی سنگ‌و کراس، پاخڵ؛ ۲) باوەش، ئامێز ف ۱) بغل؛ ۲) بر.

**باخەوان:** ئەوەی رەزو داری میوە بەخێو دەکا، رەزەوان ف باغبان.

**باد:** پێچ، با: (ئەم گشتە کە دو **بادە**) ف پیچ.

**بادار:** ۱) خۆراکێ کە پیاو بای پێ‌دەکا وەك پیواز؛ ۲) نەخۆشی باداری، رۆماتیزم؛ ۳) بریەتیە لە پیاوی لوت بەرزو بەفیز ف ۱) خوراك نفخ‌آور؛ ۲) بیماری رماتیسم؛ ۳) کنایە از آدمِ متکبّر و مغرور.

**باداك:** جۆرە گیایەکی باریك کە لە دار دەهاڵێ، گیایێ کە لەقەد دار پێچ دەخوا ف پیچك گیاه.

**بادام:** باقی، بەهیف، باوی، باام، چوالە ف بادام.

**بادامچە:** فەریکە بادام، چەقالە بادام ف چغالەبادام.

**بادامـەتـاڵـە:** بادامی تاڵ کە دەنکـەکـەی خۆش دەکەن‌و پێی دەڵێن: چوالەبادام، دانگۆ ف بادامِ تلخ.

**بادامی:** بەشکڵی بادام، زۆرتر بۆ پەسنی چاوی جوان دەگوترێ: (چاوی **بادامی** لەژێر بادا مان) «هەژار» ف لَوزی، بەشکل بادام.

**بادان:** ۱) پێچ‌دان، لێك هالاندن؛ ۲) با لێ دەرچون: (هەنبانەکە با ئەدا)؛ ۳) خەرمـــان هەلاویشتن ف ۱) تاب دادن؛ ۲) باد از چیزی خارج شدن؛ ۳) خرمن باد دادن.

**بادانەوە:** ۱) گەڕانەوە، زڤڕین، وەگەڕیان؛ ۲) لە سوچی کێو یان دیوار بوُرین؛ ۳) پەشیمـان بونـەوە، پێژەوان بون؛ ۴) با لێ بونـەوە ف ۱) برگشتن؛ ۲) از خم و پیچ گذشتن؛ ۳) پشیمان شدن؛ ۴) باد در کردن.

**باداوە:** تۆف، کڕێوە، باکوت، بادەوە ف کولاك.

**بادراو:** پێچ‌خواردو، پێچ‌دراو ف تاب خوردە.

**بادرز:** کەلێنی تەنگی بابوێر ف درز و منفذِ باد.

**بادڕەنگ:** گیایەکی بۆن خۆشە ف گیاە بادرنگ.

**بادرو:** گوڵی پۆ پەکەڵە شێرە ف گُل‌تاج خروس.

**بادریاگ:** بادراو ف تاب خوردە.

**بادگیرە:** شتێ کە پێش بەبا بگرێ، بابڕ ف بادگیر.

**بادە:** مەی، شەراو، ئەوەی پیاو مەست ئەکا ف بادە، مَی.

**بادەلێن:** بادرز ف نگا: بادرز.

**بادەم:** بادام ف بادام.

**بادەوان:** بادەوەی گەمیەی با ئاژۆ ف بادبان کشتی.

**بادەوە:** ۱) کڕێوە، بارینی بەفر بە باوە؛ ۲) بایەوانی گەمیە؛ ۳) کۆلارەی لە قاقەزی منالان، بەرزە حوایلە؛ ۴) وەگەڕێ ف ۱) کولاك؛ ۲) بادبان کشتی؛ ۳) بادبادك؛ ۴) برگرد.

**بادی:** دەفری ئاو پێ خواردنەوە ف کاسۀ آبخوری.

**بادیە:** بادی، زەرك، کاسەی چێوین ف کاسۀ چوبی.

**بادینـان:** مەڵبـەنـدێکـە لە کوردستـانـا واتا: دین‌باشان دەگەڵ وشەی «بهدینان»ی فارسی یەك دەگرێتەوە کە بە لاگرانی زەردەشتیان دەگوت ف منطقەای در کردستان.

**بادیهەوا:** ۱) خۆڕایی، فیرۆ، مفت؛ ۲) بەفیزو دەعیەو لەخۆ دەرچو ف ۱) مُفت؛ ۲) مُتکبِّر.

**بار:** ئەوەی لەسەر پشتی بارەبەری دادەنێن؛ ۲) رەخی ئاقێ: (زرێ**بار**)؛ ۳) پڕ وزۆر: (رو**بار**)؛ ۴) داب‌و ئاسایی: (دنیاکە لە **باری** خۆی نەماوە)؛ ۵) تاوان‌و قەرەبـــو: (مـــن **باری** جگـــی خۆم لە تۆ دەوێ)؛ ۶) راستـی‌و دروستی: (پیاوێکی بێ‌**بارە**)؛ ۷) کارو کردە: (تـــاوان**بـــار**، گونا**هبار**)؛ ۸) قرتماغەی سەرلێو: (هەرچەندە گوناهی دەمەکەت **بارە** لەسەر لێو / حەددی چی‌یە «نالی» کە بڵێ: ماچە کەفارەت) «نالی»؛ ۹) ئەرك‌و رەنج: (ئەمان چەند **بارت** گرانە)؛ ۱۰) شوغڵ: (خەریکی کارو **باری** خۆمـم)؛ ۱۱) بۆخ‌و سپیایی سەر زمـــان: (زمـــانم **باری** گرتـوە)؛ ۱۲) نەخـۆشی: (بیمارو لەش بە**بارم**)؛ ۱۳) تۆڵ، پیزە، پز، بێچـــوی ناو زگ: (پـــورە حەبـێ **باری** هەیە)؛ ۱۴) بەخت‌و هات: (بـابایەکی **بار** کەوتوم بۆم نایە)؛ ۱۵) سازوتەیاری؛ ۱۶) وێنە ف ۱) بار؛ ۲) ساحل؛ ۳) بسیار؛ ۴) روش؛ ۵) تاوان؛ ۶) دُرستی؛ ۷) عمل؛ ۸) تبخال؛ ۹) رنج؛ ۱۰) شغل؛ ۱۱) جرم روی زبان؛ ۱۲) بیماری؛ ۱۳) جنین؛ ۱۴) شانس؛ ۱۵) آمادگی؛ ۱۶) مانند.

**باڕ:** بێچوە مەلی بەهارە: (قەلی رەش بە چل ساڵ **باڕە**، ئەومریشکە **باڕی** پارە، **باڕە**کەو) ف جوجۀ بهارە.

**بارا:** باری، وەشت ف بارید.

**باراش:** دەغڵێ کە دەبـرێتە ئاش بۆ هاڕین تا دەهاڕدرێ ف باری کە بە آسیاب برند.

**باراش‌هاڕ:** کەسێ کە دەغڵ دەهاڕێ ف مُراجع آسیاب.

**باراش‌هێڕ:** باراش‌هاڕ ف مُراجع آسیاب.

**باچ:** باج [ف] باج.
**باچاندن:** خۆ دزینەوە، کوُزوُبون، لە پەنایەکەوە بۆی دەرچون [ف] دزدکی رفتن، جیم شدن.
**باچك:** ۱) بەلاڵوکە کێویلە. ئاڵوباڵوی جەنگەڵی؛ ۲) گەنمەشامی سور، زراتی سور [ف] ۱) آلوبالوی وحشی؛ ۲) ذرّت قرمز.
**باچوڕە:** قسەی ناماقوڵ [ف] حرف باورنکردنی.
**باچەڕێ:** کاڵەدڕانە، پاداشتی دز کاتێ ماڵی دزیەتی دەداتەوە [ف] مُزد برگرداندن مال دُزدی.
**باچیك:** هەرزن، گاڵ [ف] ارزَن.
**باخ:** دارستانی میوە، رەز، باغ [ف] باغ، تاکستان.
**باخچە:** بوخچە، باغی چکۆلە، جێی گوڵو سەوزی چاندن [ف] باغچە.
**باخلە:** توربێن، خورجی تۆودان، تۆمدان، تۆمەدانە [ف] توبره برزگران.
**باخن:** شوێنێك کە بای لێوەدێ، کونەبا [ف] منفذ باد.
**باخواردن:** گشت بون، پێچ خواردن [ف] تاب‌خوردن.
**باخۆر:** کەلێنی بچوك کە بای لێوە دێ، بابوێر [ف] ترك‌و درز دیوار، منفذِ باد.
**باخۆش:** بڵندبالاتر، لە سەرتر دەکایەدا [ف] ماهرتر در بازی.
**باخوێ:** ۱) خودا، خوا؛ ۲) رەفیق، هەواڵ [ف] ۱) خُدا؛ ۲) دوست.
**باخە:** ۱) باقە، کۆمەڵێك گیا یان دەغڵی پێکەوە بەستراو؛ ۲) دەنگ کەوتو، دەنگ نوساو؛ ۳) جۆرێ نەخۆشی سمی یەکسم [ف] ۱) بستهٔ گیاه؛ ۲) صداگرفته؛ ۳) نوعی بیماری دام.
**باخەڵ:** ۱) بەر، بەرۆك، نێوانی سنگ‌و کراس، پاخڵ؛ ۲) باوەش، ئامێز [ف] ۱) بغل؛ ۲) بر.
**باخەوان:** ئەوەی رەزو داری میوە بەخێو دەکا، رەزەوان [ف] باغبان.
**باد:** پێچ، با: (ئەم گشتە کە دو **بادە**) [ف] پیچ.
**بادار:** ۱) خۆراکێ کە پیاو بای پێ‌دەکا وەك پیواز؛ ۲) نەخۆشی باداری، رۆماتیزم؛ ۳) بریەتیە لە پیاوی لوت بەرزو بەفیز [ف] ۱) خوراك نفخ‌آور؛ ۲) بیماری رماتیسم؛ ۳) کنایه از آدمِ متکبّر و مغرور.
**باداك:** جۆرە گیایەکی باریك کە لە دار دەهاڵێ، گیایێ کە لەقەد دار پێچ دەخوا [ف] پیچك گیاه.
**بادام:** باقی، بەهیف، باوی، باام، چوالە [ف] بادام.
**بادامچە:** فەریکە بادام، چەقالە بادام [ف] چغالەبادام.
**بادامەتاڵە:** بادامی تاڵ کە دەنکەکەی خۆش دەکەن‌و پێی دەڵێن: چوالەبادام، دانگۆ [ف] بادامِ تلخ.
**بادامی:** بەشکڵی بادام، زۆرتر بۆ پەسنی چاوی جوان دەگوترێ: (چاوی **بادامی** لەژێر بادا مان) «هەژار» [ف] لَوزی، بەشکل بادام.
**بادان:** ۱) پێچ‌دان، لێك هالاندن؛ ۲) با لێ دەرچون: (هەنبانەکە با ئەدا)؛ ۳) خەرمـــان هەڵاویشتن [ف] ۱) تاب دادن؛ ۲) باد از چیزی خارج شدن؛ ۳) خرمن باد دادن.
**بادانەوە:** ۱) گەڕانەوە، زڤڕین، وەگەڕیان؛ ۲) لە سوچی کێو یان دیوار بوُرین؛ ۳) بەشیمـان بونـەوە، پێژەوان بون؛ ۴) با لێ بونـەوە [ف] ۱) برگشتن؛ ۲) ازخم و پیچ گذشتن؛ ۳) پشیمان شدن؛ ۴) باد در کردن.
**باداوە:** تۆف، کرێوە، باکوت، بادەوە [ف] کولاك.
**بادراو:** پێچ‌خواردو، پێچ‌دراو [ف] تاب خورده.
**بادرز:** کەلێنی تەنگی بابوێر [ف] درز و منفذِ باد.
**بادڕەنگ:** گیایەکی بۆن خۆشە [ف] گیاه بادرنگ.
**بادرو:** گوڵی پۆ پەکەڵە شێرە [ف] گُل‌تاج خروس.
**بادریاگ:** بادراو [ف] تاب خورده.
**بادگیرە:** شتێ کە پێش بەبا بگرێ، بابڕ [ف] بادگیر.
**بادە:** مەی، شەراو، ئەوەی پیاو مەست ئەکا [ف] بادە، مَی.
**بادەلێن:** بادرز [ف] نگا: بادرز.
**بادەم:** بادام [ف] بادام.
**بادەوان:** بادەوەی گەمیەی با ئاژۆ [ف] بادبان کشتی.
**بادەوە:** ۱) کرێوە. بارینی بەفر بە باوە؛ ۲) بایەوانی گەمیە؛ ۳) کۆلارەی لە قاقەزی منالان، بەرزە حوایلە؛ ۴) وەگەڕێ [ف] ۱) کولاك؛ ۲) بادبان کشتی؛ ۳) بادبادك؛ ۴) برگرد.
**بادی:** دەفری ئاو پێ خواردنەوە [ف] کاسهٔ آبخوری.
**بادیە:** بادی، زەرك، کاسەی چێوین [ف] کاسهٔ چوبی.
**بادینـان:** مەڵبـەنـدێکـە لە کوردستـانـا واتا: دین‌باشان دەگەڵ وشەی «بهدینان»ی فارسی یەك دەگرێتەوە کە بە لاگرانی زەردەشتیان دەگوت [ف] منطقه‌ای در کردستان.
**بادیهەوا:** ۱) خۆڕایی، فیرۆ، مفت؛ ۲) بەفیزو دەعیەو لەخۆ دەرچو [ف] ۱) مُفت؛ ۲) مُتکبِّر.
**بار:** ئەوەی لەسەر پشتی بارەبەری دادەنێن؛ ۲) رەخی ئاقێ: (زریبار)؛ ۳) پڕوزۆر: (روبار)؛ ۴) داب‌و ئاسایی: (دنیاکە لە **باری** خۆی نەماوە)؛ ۵) تاوان‌و قەرەبـــو: (مـــن **باری** جگـــی خۆم لە تۆ دەوێ)؛ ۶) راســتی‌و دروستی: (پیاوێکی بێ‌بارە)؛ ۷) کارو کردە: (تـــاوانبـــار، گوناهبار)؛ ۸) قرتماغەی سەرلێو: (هەرچەندە گوناهی دەمەکەت **بارە** لەسەر لێو / حەددی چی‌یە «نالی» کە بڵێ: ماچە کەفارەت) «نالی»؛ ۹) ئەرك‌و رەنج: (ئەمان چەند **بارت** گرانە)؛ ۱۰) شوغڵ: (خەریکی کارو **باری** خۆمـم)؛ ۱۱) بۆخ‌و سپیایی سەر زمـــان: (زمـــانم **باری** گرتـوە)؛ ۱۲) نەخـۆشی: (بیمارو لەش بە**بارم**)؛ ۱۳) تۆڵ، پیزە، پز، بێچـــوی ناو زگ: (پـــورە حەبـێ **باری** هەیە)؛ ۱۴) بەخت‌و هات: (بـابایەکی **بار** کەوتوم بۆم نایە)؛ ۱۵) سازوتەیاری؛ ۱۶) وێنە [ف] ۱) بار؛ ۲) ساحل؛ ۳) بسیار؛ ۴) روش؛ ۵) تاوان؛ ۶) دُرستی؛ ۷) عمل؛ ۸) تبخال؛ ۹) رنج؛ ۱۰) شغل؛ ۱۱) جرم روی زبان؛ ۱۲) بیماری؛ ۱۳) جنین؛ ۱۴) شانس؛ ۱۵) آمادگی؛ ۱۶) مانند.
**باڕ:** بێچوە مەلی بەهارە: (قەلی رەش بە چل ساڵ **باڕە**، ئەومریشکە **باڕی** پارە، باڕەکەو) [ف] جوجهٔ بهاره.
**بارا:** باری، وەشت [ف] بارید.
**باراش:** دەغڵێ کە دەبـرێتە ئاش بۆ هاڕین تا دەهاڕدرێ [ف] باری کە بە آسیاب برند.
**باراش‌هاڕ:** کەسێ کە دەغڵ دەهاڕێ [ف] مُراجع آسیاب.
**باراش‌هێڕ:** باراش‌هاڕ [ف] مُراجع آسیاب.

**باران:** ۱) ئاویٚ كه به دڵۆپه له هه‌ورانه‌وه دا ده‌ڕژیٚ؛ ۲) باره‌كان، چه‌ند باری باره‌به‌ر [ف] ۱) باران؛ ۲) چند بار باربر.

**باراناو:** ئاوی راوه‌ستاوی باران له قوڵكه‌دا [ف] آب باران جمع شده.

**بارانبڕان:** ئاخر و ئۆخری به‌هار كه هه‌ڕه‌تی باران‌بارین نامیٚنیٚ، مانگی جۆزه‌ردان [ف] موسم قطع‌شدن باران.

**بارانپێو:** كه‌سیٚ یان ئامرازیٚ له بارشتی زه‌وینی باران لیٚدراو ده‌كۆڵیٚته‌وه [ف] باران‌سنج.

**باران دادان:** هه‌وه‌ڵ هاتنه‌خواری باران [ف] شروع باران.

**باراندا كردن:** باران دادان [ف] شروع باران.

**باراندن:** له به‌رزیه‌وه پرژاندن: (**هه‌وره ڕه‌ش باراندی، زاوایان گوڵباران كرد**) [ف] بارانیدن.

**باڕاندن:** هاوارو گازی بزن‌و مه‌ڕ [ف] صدای بز و گوسفند.

**بارانـــه:** ۱) باران له هه‌وره‌وه؛ ۲) ئه‌و باجـــه‌ی باجگـر بۆ هه‌ربـاریٚك ده‌یسیٚنیٚ [ف] ۱) باران؛ ۲) باج‌بار.

**بارانه‌و بڕان:** باران بڕان [ف] موسم قطع‌شدن باران.

**بارانی:** ۱) هه‌وای هه‌ورو بیٚ‌تاو: (**ئـه‌مـڕۆ هه‌وا بارانیه**)؛ ۲) بالاّپۆشی باران دانه‌ده‌ر [ف] ۱) هوای بارانی؛ ۲) پالتو بارانی.

**باربـردن:** ۱) باركیٚشانی باره‌به‌ر؛ ۲) باردزین: (**دزهات باره‌كانی برد**)؛ ۳) هه‌ڵكردن‌و لیٚ قه‌بوڵكردن: (**به‌خوا برا من باری تۆ نابه‌م**) [ف] ۱) حمل بار؛ ۲) دزدیدن محموله؛ ۳) تحمُّل.

**باربـو:** یارمـه‌تی‌دانی هه‌ژارو په‌ك‌كه‌وتـه به پوڵ‌و ماڵ له لایه‌ن هاوساو هاوماڵانه‌وه [ف] كمك مالی.

**باربه‌ست:** ئاماده‌ی سه‌فه‌ر [ف] مُهیّای سفر.

**باربه‌ستن:** تیٚك‌نانی ئه‌سپاپ‌و كه‌ل‌و په‌لی سه‌فه‌ر [ف] رختِ سفر بستن.

**باربه‌سته:** باربه‌ست [ف] نگا: باربه‌ست.

**باربـــه‌نـــد:** ۱) گوریســـی بار پیٚچـــان؛ ۲) ته‌ویله‌ی سه‌ر نه‌گیراوی هه‌ڵبه‌ستراو بۆ یه‌كسم، به‌هاربه‌ند [ف] ۱) طناب باربندی؛ ۲) بهاربَند.

**باربه‌ندی:** پیٚچاندنه‌وه‌ی باروبنه [ف] باربندی.

**باربه‌نی:** باربه‌ندی [ف] باربندی.

**بارته‌قا:** هه‌مبه‌ر، به‌رانبه‌ر، باته‌قا [ف] برابر.

**بارچه‌وت:** پیاوی ناڕاست، بیٚ ئاكار [ف] كنایه از آدم ناراست.

**بارخانه:** ۱) ئه‌و بارانه‌ی كه‌ل‌و په‌لی بازرگانین: (**بارو بارخانه‌یه‌كی زۆر هات**)؛ ۲) باری له‌سه‌ریه‌ك هه‌ڵچناو: (**هه‌موم له عه‌نباردا له بارخانه داوه**)؛ ۳) وه‌ختی توتن فرۆشتن: (**قـه‌رزه‌كـه‌ت له بارخـانـه‌ی توتن ده‌ده‌مـه‌وه**) [ف] ۱) محمولهٔ بازرگانی؛ ۲) بار برهم انباشته؛ ۳) موسم فروش تنباكو.

**بارخانو:** هیم، خیم، بناغه [ف] اساس، شالوده.

**بارخانی:** بارخانو [ف] اساس، شالوده.

**بارخستن:** ۱) ئیسـراحه‌ت‌كردنی كاروان: (**با لیٚره باران بخه‌ین**)؛ ۲) بیٚچـو له‌بـه‌ر چون: (**ئـه‌م بزنـه ئه‌مساڵ باری خست**) [ف] ۱) اُتراق كاروان؛ ۲) بچّه انداختن.

**باردابه‌ستن:** زۆر توند پیٚچانی بار [ف] محكم باری را بستن.

**باردار:** زگ‌پڕ، ئاوس [ف] باردار.

**بارداگـرتن:** ۱) ده‌فـر پڕكـردن به نیازی باركـردن: (**بـاران داگـره تا باركـه‌ین**)؛ ۲) هینـانه‌خواری بار [ف] ۱) جوال پُركردن؛ ۲) باری را پائین آوردن.

**بارڕاست كردنه‌وه:** ۱) لاباری خوار هه‌ڵیٚنان؛ ۲) بریه‌تیه له كۆمه‌گ‌و ده‌فریا هاتن: (**زۆر لیٚ قه‌وماو بوم كاكم باری ڕاست كردمه‌وه**) [ف] ۱) راست نمودن بار كج؛ ۲) كنایه از كمك كردن و فریادرسی.

**بارژن:** بارشت، بارین [ف] باریدن باران.

**بارسایی:** بارست [ف] حجم.

**بارست:** ئه‌ستوُری‌و بڵندی، حه‌جم: (**بارستی به‌فر بستیٚك‌بو، بارستی ئه‌ستوُرایی ماره‌كه قولیٚك ده‌بو**) [ف] حجم.

**بارستایی:** بارست [ف] حجم.

**بارسوك:** ۱) كه‌م ئه‌رك؛ ۲) خه‌م نه‌خۆر بۆ ماڵی دنیا؛ ۳) هه‌ژارو نه‌دار: (**كه‌ركوڵ‌و بارسوك**) [ف] ۱) كم تعلُّق؛ ۲) سبكبار؛ ۳) بی‌چیز و ندار.

**بارسوك كردن:** ۱) زه‌حمه‌ت‌و ده‌رد له‌سه‌ر خه‌ڵك كه‌م‌كردن؛ ۲) له‌باری باره‌به‌ر كه‌م‌كردن [ف] ۱) كمك؛ ۲) از بار باربر كاستن.

**بارسوُكی:** بریتی‌له ئاسوُده‌یی‌و كه‌م ئه‌ركی [ف] سبكباری.

**بارش:** ۱) بارین له هه‌وره‌وه، داڕژانی به‌فر یا باران یا ته‌رزه؛ ۲) وارش [ف] ۱) بارش؛ ۲) حصار.

**بارشت:** بارش [ف] بارش.

**باڕك:** جوجه‌ڵه مریشكی به‌هاره [ف] جوجهٔ بهاره.

**باركـردن:** ۱) بار له‌سـه‌ر پشتی باره‌بـه‌ر دانـان؛ ۲) كۆچ‌كردن [ف] ۱) باركردن؛ ۲) كوچ كردن.

**باركه‌فتن:** تۆشی نزوُلی هاتن، بخت كه‌وتن، بۆ نه‌هاتن، نه‌هامه‌تی [ف] بدبیاری.

**باركه‌وتن:** باركه‌فتن [ف] بدآوردن.

**باركه‌وتو:** بۆ نه‌هاتو، خراپ لیٚ قه‌وماو [ف] بدبخت.

**باركه‌وته:** باركه‌وتو [ف] بدشانس.

**باركیٚش:** باره‌به‌ری به‌هیٚز [ف] باركش.

**باركیٚشـان:** زه‌حمـه‌ت كیٚشان، ئه‌ركی خه‌ڵك وه‌ستۆ گرتن [ف] بار مردم بدوش كشیدن.

**بارگا:** ده‌زگاو خانو به‌ره‌ی گه‌وره پیاوان [ف] بارگاه.

**بارگر:** داریٚ كه ئه‌یخه‌نه چینی باره كانی بارخانه تا نه‌ڕمیٚ [ف] چوب لایهٔ بار.

**بارگـران:** ۱) بارقورس، كه‌سیٚ‌كه ئه‌ركی زۆری له‌سه‌ره؛ ۲) بریه‌تی له میوانی چاو نه‌زیٚر یان هه‌واڵی خویٚنتـاڵ؛ ۳) ته‌مـه‌ڵ‌و ته‌وه‌زه‌ل، له‌ش قورس [ف] ۱) رنجبر، زحمتكش؛ ۲) مهمان سِمِج و گران‌جان؛ ۳) تَنْبَل.

**بارگرانایی:** ئه‌ركی‌زۆر [ف] رنج بسیار.

**بارگرانی:** ئه‌رك‌و ماندویی زۆر، بارگرانایی [ف] رنج طاقت‌فرسا.

**بارگـه:** ۱) خورجیٚن‌و به‌رو بوخچـه‌ی سه‌فه‌ر؛ ۲) باری خوارده‌مه‌نی‌و ئه‌سپابی سه‌فه‌ری پیاوی ماقوڵ [ف] ۱) رخت سفر؛ ۲) بار و بنهٔ سفر

بزرگان.

**بارگەتێك نان:** خۆ ئامادە کردن بۆ سەفەر ف رخت سفر بر بستن.

**بارگەچی:** ۱) کەسێ کە ئابدارباشی سەفەری ماقولانە؛ ۲) سەرقافڵەی، کاروان ف ۱) آبدارباشی؛ ۲) قافلەسالار.

**بارگەوبنە:** کەل و پەل و ئەسپاوی سەفەر ف باروبنە.

**بارگیر:** ئەسپی بارەبەر، ئەسپی نازەسەن ف یابو.

**بارگیل:** بارگیر ف یابو.

**بارگین:** بارگیر ف یابو.

**بارلێنان:** کۆچ کردن، باری سەفەر بەستن ف کوچ.

**بارماخ:** قامیشە جگەرە ف ورق سیگار فیلتردار.

**بارمتە:** گرۆ، گرێو، شتێك لەباتی شتێکی تر بە ئەمانەت داندرابێ ف گروگان.

**بارن:** ۱) بەفرێ کە با لە بڵندایی و زەقایی بردبێتی و دە قوڵکەی پەستاوتبێ؛ ۲) میوەی کە با وەراندویەتی، باوەڕێن ف ۱) برفی که باد آنرا جمع کرده باشد؛ ۲) میوهٔ باد ریخته.

**بارنامە:** پسولەی سیایی باران ف بارنامه.

**باندۆخ:** بەبارشت، بەباران، بارێن: (هەورێکی **بارندۆخ** بو) ف بارنده.

**بارنەبردن:** هەڵنەکردن، گوزەران نەکردن دەگەڵ یەکێ: (هەرچێ دەکەم باری **نابەم**) ف تحمُّل نکردن زندگی.

**بارنەبەر:** بریەتی لە گوێ نەبیس و لاسارو نەگونجاو ف بازیگوش.

**بارنەوەر:** بارنەبەر ف بازیگوش.

**باروبـارخـانـە:** ۱) کەل پەلی پارچەو شتی تر کە بە کاروان دێت؛ ۲) بەهیما بۆ کەفەڵی گەورەی ژنانی دەڵێن: (عەجەب **بارو بارخانە**یەکی هەیە) ف ۱) کالای تجارتی؛ ۲) کنایه از باسن بزرگ.

**باروبو:** باربو ف کمك.

**باڕوت:** دەرمان تفەنگ، باروت ف باروت.

**باروتخانە:** جبەخانە، جەبەڵخانە، جێگەی چەك و فیشەك پڕکردنەوە ف زرّادخانه.

**باروتی:** زۆر ورد: (چای **باروتی** دەکڕم) ف باروتی، بسیار ریز.

**باروشك:** بارانی بەباوە، شڵێوە ف باد و باران با هم.

**باڕوشە:** باوەشێن، باڕۆشە ف بادبزن.

**باڕۆشە:** باڕوشە ف بادبزن.

**باڕۆکە:** جوجەڵە مریشکی بەهارەی ساڵ تەواو نەکردو ف جوجهٔ بهاری.

**باڕۆگ:** باگر، باپێچ، شوێنێ کە زۆر با بگرێتەوە ف مکان بادگیر.

**بارونە:** گیایەکی بۆن خۆشە دەگەڵ پەنیر ئەیخۆن، بادڕەنگ ف گیاه بادرنگ.

**بارە:** ۱) بهێنـە، وەرێنـە؛ ۲) بەهـرەو داهات: (**بارە**ی موڵکەکەت چەند بو؟)؛ ۳) لەمەڕ، لەبابەت: (دەر **بارە**ی تۆ بو، دەر **بارە**ی منەوە دەدوان)؛ ۴) جار، کەڕەت، هەل، چەل: (دو**بـارە** هاتەوە)؛ ۵) بەش، بێش، پار: (لەو بەش بەشێنە **بارە**ی من چەندە؟)؛ ۶) قەرەبو، تۆڵ: (**بارە کەلای** خۆم دەستێنمەوە)؛ ۷) هێز، توانایی: (ئەم کارە گرانە لە**بارە**ی منا نیە) ف ۱) *فعل امر*: بیاور؛ ۲) حاصل و بهره؛ ۳) دربارهٔ؛ ۴) دفعه، بار؛ ۵) سهم؛ ۶) جبران، تلافی؛ ۷) توانایی.

**باڕە:** هاواری ئاژەڵی وردە ف بَع‌بَع.

**بارهـاتن:** هەڵکـەوتن، ڕەخسـان، خوگرتنی ڕۆژانی منالی: (ئەم هەتیوە باش **بارنەهاتوە**) ف بارآمدن.

**باڕەبار:** هەراو هوریای ئاژەڵی وردە ف صدای بز و گوسفند.

**بارەبو:** باربو ف کمك.

**بارەبـەر:** هەرچی باری بکـەن و باری پێ بگـوێزنـەوە: (هێنـدە ڕوتـە، **بارەبەری** سەگە) ف باربر.

**بارەچە:** داهات، دەرامەت ف درآمد.

**بارەش:** بیهێنە، بۆمی بێنە، بێرانی ف بیارش.

**باڕەش:** ڕەشەبا، بای هەرە بەقەوەت ف باد شرقی.

**بارەقـەڵـلا:** ئافەرم، ئافارم، دەست خۆش، چاکت کرد: (حەمەی وەستا فەتاح سەد **بارەقەڵلا** لەم هەمو ڕیشە / بەتەنیا گوێدرێژێ چۆن دەبا ئەو بارە قامیشە) «شیخ رەزا» ف آفرین.

**بارە کەلا:** لەجیاتی هەڵمەت، قەرەبوی مەڕمەڕی کایە ف تعویض تیله.

**بارە کەللا:** بارە کەلا ف تعویض تیله.

**بارە کەڵلا:** بارەقەڵلا ف بارك‌الله.

**باڕە کەو:** جوجکە کەو ف جوجهٔ کبك.

**بارە کی:** بارەبەر ف باربَر.

**بارە گا:** بارگا ف بارگاه.

**بارەنداز:** جێگەی خستنی بار ف باراَنداز.

**بارهنگێڤ:** ۱) بەرد یان داری پەنا ڕێگە کە باری تێ دەگیرێ؛ ۲) کەسێ کە بە گاڵتە پێ کردن خەڵك تۆڕە دەکا ف ۱) مانعی در کنار راه که بار با آن برخورد کند؛ ۲) مسخره کننده.

**بارەنگێو:** بەردو داری پەنا ڕێ کە بار تیێ دەهاڵقێ ف نگا: بارهنگێڤ.

**بارەنناز:** بارەنداز ف بارانداز.

**بارهەڵگر:** ۱) بارەبەر؛ ۲) ڕنجدەر و زەحمەتکێش ف ۱) و ۲) زحمتکش.

**بارەیَ:** بیهێنە، ئەوەبێنە، بۆمی بارە، بارەش ف بیارش.

**باری:** ۱) شیاوی بارکـردن، بەرانبـەری سواری؛ ۲) لۆسـە، باریە، ئاسنێکی وەك داردەستی دەم تیژە وەبن بەردی قورسی دەدەن تا هەڵی بێنن، مەڵغە، لەوازە، نوێڵ، دەلەم ف ۱) باری؛ ۲) دَیْلَم.

**بارێ:** نەیسە، هەرچۆنی بێت، باڵێ ف باری بهرجهت.

**باڕیزە:** ۱) گیایەکە لە کەرەوز تەکا؛ ۲) باوەڕێن، ئەو میوەی با دەیوەرێنێ؛ ۳) وردە بـارانـی بە دەم باوە ف ۱) گیاهی است؛ ۲) میوهٔ از درخت ریخته؛ ۳) نم‌نم باران.

**باریسە:** ۱) فڕفڕە، فڕفڕۆکە؛ ۲) داری نێوان کوڵەکەو کاریتە ف فِرفرهٔ کاغذی؛ ۲) چوب میان ستون و دیرك.

**باریك:** ۱) زراف، بەرانبەری ئەستور؛ ۲) لەڕو لاواز ف ۱) باریك؛ ۳) لاغر.

**باریکـان:** ۱) ڕیسی زۆر باریك و ناسـك؛ ۲) لوتە کێو لە بنارەوە بەرەو دەشت، لای باریکایی ف ۱) نخ نازك؛ ۲) دماغهٔ کوه.

**باریك ڕێسی:** بریتی لە دانەواندن و قسەی لوس کردن ف تملُّق.

**باریك و بنێسی:** لەڕی و كزی زۆر لە نەخۆشیەوە: (خەسوم داویەتە باریك و **بنێسی** لەوانەیە نەژی) ف لاغری بیش از حد.

**باریكە:** ١) تیزمالك، پارچەیەكی كەمبەر لە چەرم یان كوتاڵ؛ ٢) ریزە تەقەڵی پەراوێزی جلك لە دەرەوە ف ١) نوار؛ ٢) دوختِ حاشیهٔ لباس.

**باریكەرێ:** ڕچە، كوێرەرێ، ڕێگەی تەسك ف كورەراه.

**باریكەڵانە:** باریكەلانە، زۆر باریك و لەڕ، باریكەڵە ف باریك اندام.

**باریكەلانە:** باریكەڵانە ف لاغر اندام.

**باریكەڵە:** باریكەلە، باریكەلانە ف لاغر اندام.

**باریكەلە:** باریكەڵانە ف لاغر اندام.

**باریكی:** زراڤی ف باریكی.

**بارین:** ١) هاتنەخواری بەفر و باران؛ ٢) هاوردن، هێنان ف ١) باریدن؛ ٢) آوردن.

**بارێن:** ئەوی دەبارێنێ: (هەورێكی **بارێنە**) ف بارنده.

**بارینە:** وەنەوز، چوڕت، خەو نوچكە ف پینكی.

**باریە:** لۆسە، مەڵغە، باری، نوێڵ ف دیلم.

**باز:** ١) مەلی ڕاوچی بەناو؛ ٢) دیسان، دوبارە؛ ٣) ئاواڵە، والا؛ ٤) شەقام، هەنگاوی بڵند دەگەڵ هەڵبەزین؛ ٥) ڕێگەی ناسراو: (پردە**باز**، ڕێباز، بازی بیر یان)؛ ٦) ڕاكردن، هەڵاتن: (ڕەشۆ لشێردا **بازدا**)؛ ٧) بەغار و پەلە ڕۆیشتن: (**بازدە** زو بگەهە)؛ ٨) پاشگری لێزانی: (قوماڕباز، مەكرباز)؛ ٩) دوڕێن: (گیانباز)؛ ١٠) بەواتا ئارەزوكەر: (مێباز، نێرباز)؛ ١١) باج و پیتاك ف ١) باز شكاری؛ ٢) دوباره؛ ٣) باز و سرگشاده؛ ٤) راه؛ ٥) راه مُشخص؛ ٦) فرار كردن، دویدن؛ ٧) باعَجله؛ ٨) پسوندِ مهارت؛ ٩) باختن؛ ١٠) آرزومند؛ ١١) باج.

**بازار:** ١) شوێنی سەوداو مامەڵە، سوك؛ ٢) سەودا كردن، نرخ پرسین: (م گەنم **بازار** كر گەلەكی بوهایە) ف ١) بازار؛ ٢) مُعامله.

**بازارتیژی:** گەرم بازاڕی، سەودای زۆر لە بازاردا ف بازارگرمی.

**بازارخۆش:** زۆرفرۆش، سەوداخۆش ف خوش‌معامله.

**بازاركرن:** ١) نرخ پرسین؛ ٢) كڕین ف ١) نرخ پرسیدن؛ ٢) خریدن.

**بازاركەر:** كەسێ كە زۆر هاتوچوی بازار دەكاو شت بۆ خەڵك ئەكڕێ ف كسی كه سروكارش با بازار زیاد باشد.

**بازاركەساد:** كەمفرۆش ف بازاركساد.

**بازاركەسادی:** بازاری كەمكڕین و فرۆشتن ف ركود بازار.

**بازار كەساس:** بازار كەساد ف بازار كساد.

**بازاركەساسی:** بازاركەسادی ف كسادی بازار.

**بازارگەرمی:** بازارتیژی ف بازارگرمی.

**بازاڕی:** ١) دوكاندار، مامەڵەچی ناو بازار؛ ٢) كەم نرخ و سوك: (گوڵ ئەمڕۆ خۆی مقابیل كرد بە ڕوخسارت لەلای خەڵقی / بەڵێ هەردەم دڕاوو هەرزەگۆن مەحبوبی **بازاڕی**) «حریق» ف ١) بازاری؛ ٢) كم‌بها.

**بازباز:** هەڵبەز دابەزو بەخۆ هەڵدان هاتوچۆ كردن: (مشكان لەمێشكی وشكت **بازبازو** گەز گەزێنە) «هەژار» ف پرش، جهش.

**بازبازان:** ١) كێبەركێ لە بازداندا؛ ٢) بزۆزی و هەڵبەزدابەز، بازباز ف ١) مسابقهٔ پرش؛ ٢) جَست و خیز.

**بازبازۆكێ:** بازبازان ف مسابقهٔ پرش.

**بازبازێن:** بازبازان ف مسابقهٔ پَرش.

**بازبەند:** بازوبەند، خشڵی قۆڵ، حەمایەڵی بەمت و مورەوە كە لە سەروی ئانیشكەوە دەبەستری ف بازوبند.

**بازپەڕێن:** ئەوكەسەی لەڕاوە بازدا باز بەرەو نێچیر هەڵدەفرێنێ، قوشچی، بازەوان ف بازیَران، قوشچی.

**بازد:** باز، شەقاوی بەهەڵبەزینەوە ف پَرش.

**بازدان:** ١) پەڕین بەهەنگاو لە جۆگە یان لە كەند؛ ٢) بەپەلە ڕۆیشتن، غاردان؛ ٣) لەترسان هەڵاتن ف ١) پریدن؛ ٢) دویدن؛ ٣) فراكردن.

**بازدبازدێن:** بازبازێن ف مسابقهٔ پرش.

**بازد بازۆكێ:** بازبازێن ف مسابقهٔ پرش.

**بازدبردن:** بازدان ف نگا: بازدان.

**بازددان:** بازدان ف نگا: بازدان.

**بازدەبەران:** دوامین حەوەتەی ڕەشەمە كە خۆر لە ئاوابوندا جێ گۆڕكێ دەكاو دەراو هەراو تردەكا ف حالت آفتاب در آخرین هفتهٔ اسفند.

**بازدەڵبازد:** بازبازێن ف مسابقهٔ پرش.

**بازدێ:** بهێڵن، وازبێنن، بێڵانن ف بگذارید.

**بازدێم:** وێڵم كەن، لێم گەڕێن ف ولم كُنید.

**بازڕ:** باڵدارێكی بۆرو گچكەو گۆشتخۆرە، مشك گرە ف از مرغان كوچك شكاری.

**بازرگان:** سەوداگەر، ماڵفرۆش ف بازرگان.

**بازرگانی:** سەوداگەری، داوستەد ف بازرگانی.

**بازرە:** ١) كەوانە، وێكەوتنی هاوێژراو لە بەرد یا دیوارو گەڕانەوە: (بەردەكەی هاویشتم وەدیوار كەوت **بازرەی** كردو سەری خۆمی شكاند)؛ ٢) دەرپەڕین و تەرەبون: (كەروێشكەكە لەلان دەرپەڕی و **بازرە**بو، بۆ **بازرەت** كرد؟) ف ١) كَمانه؛ ٢) جهش و گریز ناگهانی.

**بازرەقە:** ١) بازرە؛ ٢) فیچقەكردنی ئاو یا خوێن ف ١) نگا: بازرە؛ ٢) فَوَرانْ.

**بازریشك:** بارینی بەفر و باران بەباوە ف بارش همراه باد تُند.

**بازگ:** بازو، دوڕەنگ، ئەبڵەق ف خلنگ.

**بازگۆڕ:** ١) یاریدەو كۆمەگ، هاریكاری: (**بازگۆڕی**: هاریكاری كردن)؛ ٢) هیواو هومێد ف ١) كمك؛ ٢) اُمید.

**بازگە:** ١) جێگە بازدان؛ ٢) ڕێگەی هاتوچۆی حەیوانەكێوی ف ١) محل پرش؛ ٢) گُذرِ بُز كوهی.

**بازگەشت:** پێژیوان، پەشیمان ف پَشیمان.

**بازمان:** پاشەكەوت، لێ‌بەجێماو ف پس‌اَنداز.

**بازن:** موچەوانە، دەستەوانەی ئاڵقە لە زێڕ یان لە زێو، بازنە: (لە گۆوەندی میری مەزن / دەستیان دەشت، تەڕبون **بازن**) ف اَلنگو.

**بازند:** بازن ف اَلنگو.

**بازنە:** ١) بازن؛ ٢) گەوی ئاسن كە وەك بازن لە شكستەی دەهاڵێنن ف ١) اَلنگو؛ ٢) حلقهٔ آهنی.

**بازو:** ۱) بازگ؛ ۲) باهوّ، قوّلّ [ف] ۱) دورنگ؛ ۲) بازو.

**بازوبەن:** بازبەند [ف] بازوبند.

**بازوبەند:** بازبەند [ف] بازوبند.

**بازوّر:** بازرّ، مەلیّکی بوّری بچوکە، مشك‌گرە [ف] پرندەای است کوچك بەرنگ خاکستری.

**بازە:** ۱) بازگ؛ ۲) جوّرە کوتالّیّکی ئەستور؛ ۳) ناوی سەگ؛ ۴) بهیّلّە: (**بازە** با دلّەکەم ساتیّ بی‌خەم بوّ) [ف] ۱) دورنگ؛ ۲) نوعی قماش؛ ۳) اسم سگ؛ ۴) بگذار.

**بازەبەر:** پردەباز، بەردی ناو چەمو بوار کە بەسەریا باز ئەدەن بوّ پەڕینەوە [ف] گُدار، سنگ گُدار.

**بازەبەران:** بازدە بەران [ف] نگا: بازدەبەران.

**بازەلّە:** ۱) بەلّەکی کەم؛ ۲) شەرم شکاو؛ ۲) خرکەلّەو هەراش: (منالّەکەتان **بازەلّە** بوە)؛ ۴) قەمچان، ریّخان، گەمەیەکە بە وردە بەردی لوس ئەکریّ، بازەلّین [ف] ۱) دورنگ؛ ۲) از خجالت درآمدە؛ ۳) بالندگی کودك؛ ۴) یەقول دوقول.

**بازەلّین:** قەمچان، ریّخان، گەمەیەکە کە وردە بەرد لە لەپەوە هەلّداویّنە پشتی دەستو هەلّیدە دەنو دەیگرنەوە [ف] یەقول دوقول.

**بازەوان:** ئاگاداری بازی‌ڕاو [ف] نگهبان باز شکاری.

**بازی:** ۱) گەمە، گالّتە؛ ۲) لە پاشگریدا دەبیّتە چاوگەی باز بە هەموماناوە [ف] ۱) بازی؛ ۲) در حالت پسوند مصدر «باز».

**بازیّ:** ۱) هیّندیّ: (**بازیّ** کەس تیّ‌ناگەن ئیّژم چە؟)؛ ۲) هەنگاویّکی هەراو [ف] ۱) بعضی؛ ۲) یك پَرش.

**بازی‌بەند:** بازوبەند، قوّلّبەند [ف] بازوبند.

**بازیچە:** لەیستوّك، ئامرازی گالّتەو سەرگەرمی [ف] بازیچە.

**بازین:** دوّران، خوسار [ف] باختن.

**بازیوەن:** بازوبەند [ف] بازوبند.

**باژ:** باج [ف] باج.

**باژارّ:** شار، شاروّکە [ف] شهر، شهرك.

**باژارّی:** شارستانی، خەلّکی باژیرّ [ف] شهروَند.

**باژوّ:** ۱) گەمیەیّ بادەوەی هەبیّ؛ ۲) لیّخورّە [ف] ۱) کشتی بادبانی؛ ۲) بران.

**باژەلّە:** ۱) بازرە؛ ۲) نەخوّشیەکی پیّستە تایبەتی مندالاّن، زیپکەیان لە دەستو پا دیّت [ف] ۱) نگا: بازرە؛ ۲) مرضی پوستی در کودکان.

**باژیرّ:** ۱) شار، شاروّکە؛ ۲) بازار [ف] ۱) شهر؛ ۲) بازار.

**باژیرّی:** شارستانی، باژارّی [ف] شهروند.

**باژیلە:** ۱) نەخوّشی پیّستی منالاّن، باژەلّە؛ ۲) نەخوّشی بەر مسولّدانی منالّ کە میزی پیّ ناکریّ [ف] ۱) مرض پوستی کودکان؛ ۲) شاش‌بند کودکان.

**باژیلّە:** ۱) باژیلە؛ ۲) بازرەو تەرە [ف] ۱) نگا: باژیلە؛ ۲) نگا: بازرە.

**باس:** ۱) لیّ‌دوان؛ ۲) خەبەر: (**باسی** توّمان دەکرد، دەنگو **باس** چیە؟) [ف] ۱) بحث؛ ۲) خبر.

**باسترمە:** گوّشتی دە ریخوّلّە ئاخنراو [ف] کالباس.

**باستورمە:** گوّشتی لیّنراوی دەریخوّلّە ئاخناو [ف] کالباس.

**باستیك:** باسوخ، باسوق، باسوز، شتیّکی شیرینە لە نیشاستەو شیرە دەکریّ [ف] باسُلق.

**باسرّە:** شویّنیّ با زوّری بگریّتەوە [ف] جای بسیار بادگیر.

**باسریشك:** بەفرو بارانو با پیّکەوە [ف] بارش برف و باران و وزش باد با هم.

**باس قەندە:** کلکە سەبیلەی دارین [ف] دستۀ بلند چُپُق.

**باس‌قەنگە:** باس قەندە [ف] دستۀ بلند چُپُق.

**باس‌قەننە:** باس‌قەندە [ف] دستۀ بلند چُپُق.

**باسك:** ۱) لە جومگەی دەستەوە تا هانیشك؛ ۲) لە سەری پەنجەوە تا شان: (مەلە **باسکە**)؛ ۳) ملەی کیّو، بستو؛ ۴) دار جگەرە، موّدنە، دەمنە، دارسیغار؛ ۵) بالّی مەل [ف] ۱) ساعد دست؛ ۲) بارو؛ ۳) ستیغ کوە؛ ۴) چوب سیگاری؛ ۵) بال پرندە.

**باسکردن:** وتو ویژّ دەربارەی شتیّ یا کەسیّ [ف] گفتگو.

**باسکلاّو:** گەلاّی ریّواس، ریّواسی بیّ‌نیّرتك، کلاّوبن [ف] برگ ریواس.

**باسکەسەگ:** سەگی دورە کە دایك تاژیو باوك سەگەو باریکە لّەیە [ف] سگ دورگە شکاری.

**باسکەمەلە:** جوّریّ مەلە کە بە تەوژمی باسك هاویّشتن دەبیّ، مەلەباسکە [ف] نوعی شنا، شنای کرال.

**باسکەوجارّ:** باسکیّش [ف] چوب درازین خیش.

**باسکیّش:** ئیّرەقە، داری نیّوان نیر و دەندە، مژانە، باسکەوجارّ [ف] چوب درازین خیش.

**باسلق:** باسوخ، باستیك [ف] باسُلق.

**باسمباز:** حەوروّژی پڕ بارانی سەرە بەهار [ف] هفت روز بارانی در فروردین.

**باسمە:** شقلّی خەرمان [ف] مُهر خرمَن.

**باسمیّل:** بەفیزو خوّرانەر: (*باسمیّلی: فیزودەعیە*) [ف] متکبر و خودپسند.

**باسنامە:** کتیّبی چیروّکان، داستانی نوسراو [ف] کتاب داستان.

**باسوخ:** باستیك [ف] باسُلق.

**باس‌وخواس:** خەبەر، دەنگو باس [ف] اخبار.

**باسوّر:** بای‌سور، نەخوّشیەکی گرانە، نەخوّش تای گرانی لیّ دیّو لاچاوی سوردەبیّ، بای ممبارەك [ف] بیماری بادِ سرخ.

**باسورمە:** باستورمە [ف] نگا: باستورمە.

**باسوق:** باستیك، باسوخ [ف] باسُلق.

**باسەر:** بای لە بەرزیەوە [ف] تندبادی کە از ارتفاع وَزَد.

**باسەرە:** باسرّە [ف] نگا: باسرّە.

**باسەرّە:** میّرگو بژویّنو جیّ لەوەرّی باش [ف] چراگاە، مَرتَع.

**باش:** ۱) چاك، دژی خراپ؛ ۲) پاشگر بە واتا: کار بەدەست: (وریا لای ئاغا بویتە سور **باش**) [ف] ۱) خوب، نیکو؛ ۲) پسوند بەمعنی رئیس.

**باشار:** ۱) دەربردن، خوّرّاگرتن؛ ۲) بەرانبەری، پیّ‌وەستان: (کەس باشاری ناکا) [ف] ۱) مقاومت؛ ۲) مقابلە.

**باشتر:** چاکتر [ف] بهتر.

**باشترین:** هەرەچاك [ف] بهترین.

**باش قەپان:** جۆرە ماریکی زەردی ئامالْ سور [ف] نوعی مار.
**باشلوخ:** سەرکلاوی باران دانەدەر [ف] کلاه بارانی.
**باشوُ:** واشە، باشوُك [ف] چَرغ.
**باشو بۆشی:** دەس بلاوی، مالْ بەفیڕۆدان [ف] ولخرجی.
**باشوُر:** لای قوبلە، نێوان خۆر هەلات‌و ڕۆژاواو بەرانبەر بە باکوُر [ف] جُنوب.
**باشوُك:** باشوُ، باشوُکە، مەلێکی ڕاوکەری بچوکە چۆلەکە دەگرێ، واشە [ف] چَرغ.
**باشوُکە:** باشوُك [ف] چَرغ.
**باشوێل:** جۆرێ کۆلوانەی ژنانە [ف] نوعی رودوشی زنان.
**باشە:** ۱) باشوُك؛ ۲) وشەی پەسند کردن: (پیروت پیاوی **باشە**) [ف] ۱) چَرغ؛ ۲) خوب است.
**باشەل:** چارۆکەی ژنان کە دامێنی لە کەمبەریان گرێ دەدەن، کۆلوانە [ف] رودوشی زنانە.
**باشەوالا:** بریتی لە لینگ روت‌و بێ‌دەر پێ [ف] کنایە از شخص بدون شلوار.
**باشی:** ۱) پەسنـدی، دژی خرابی؛ ۲) باشگـر ی بەمـانـا سەرکـار، سەردەستـە: (لـوُتی **باشی**، مونشی **باشی**) [ف] ۱) خوبی؛ ۲) پسوند بەمعنی سردستە.
**باشێل:** باشەل، کۆلوانە [ف] رودوشی زنانە.
**باشیل:** ئاوارەو دەربەدەر [ف] آوارە و خانەبدوش.
**باع:** دەنگی مەڕو بەرخ [ف] بَع‌بَع.
**باعە:** باع: (**باعەی** بەرخ دێت، مەڕە کە **دەباعێنێ**) [ف] صدای گوسفند.
**باعیس:** سەبەب، هۆ، سۆنگە [ف] موجب، باعث.
**باغ:** باخ، دارستانی میوە، رەزی ترێ [ف] باغ.
**باغبڕین:** ۱) لەدوژمنایەتی داری باغ بڕینەوە؛ ۲) هەڵپەرتاوتنی لکە مێو لە سەرە بەهـاردا [ف] ۱) قطع درختانِ باغ از روی دشمنی؛ ۲) هَرَسْ کردن رَز.
**باغچە:** باخچە [ف] باغچە.
**باغر:** لەخۆ دەرچو، بەفیزو هەوا: (کاورا بەهەوای پارە **باغر** بوە لەخۆی دەرچوە) [ف] مَغرور.
**باغە:** ۱) باقەی گیاو گەنم، بەستە؛ ۲) چێکراو لە بنێشت یا ماکی نەوت: (تـەزبێحـەکـەم **باغـە**یە بە ئاگر دەسـوتێ)؛ ۳) نەخۆشیەکی سمی یەکسم، باخە [ف] ۱) بستهٔ گیاه؛ ۲) مصنوع از نفت یا سقز؛ ۳) مرضی در ستوران.
**باغەڵ:** باخەڵ، پاخڵ [ف] بغل.
**باغەوان:** ئاگاداری باغ: (من کارم هەر **باغەوانی**یە) [ف] باغبان.
**بافت:** ۱) شیاوی، رەوایی: (**بافتی** ئەم‌کارە نیە)؛ ۲) هۆنە، هۆندراو: (ئەم کەوایە زێڕ**بافتە**)؛ ۳) خەرج: (سەیدی هەرچێش بێ **بافتی** رای تۆش کەرد) [ف] ۱) شایستگی؛ ۲) بافت؛ ۳) خرج.
**بافتە:** تیزماڵکێکی هۆندراو لە پەراوێزی عەبای دەدورن [ف] نوار حاشیهٔ عبا.

**بافروُ:** بوختان‌و درۆ [ف] بُهتان.
**بافـرە:** ۱) کەتیرەی سپی‌و بێ خەوش؛ ۲) ناوی پەڕەسیغـارێکە [ف] ۱) کتیرای خوب؛ ۲) نوعی کاغذ سیگار.
**بافڕە:** فڕفڕە، هەرچی بەبا دەخولێتەوە [ف] بادفَر.
**بافس:** میوەی وەریوی رزیو [ف] میوهٔ ریختهٔ له شُده.
**بافڵ:** ئاو هەڵدێر، تافگە، سەروەشێن [ف] آبشار.
**بافلەھ** : تازە موسوڵمانی خاچ‌پەرست [ف] مسیحی تازه مسلمان شده.
**بافوُر:** ۱) تریاك؛ ۲) ئەسبابی تریاك‌کێشان [ف] ۱) تریاك؛ ۲) ابزار تریاك‌کشی.
**بافیاگ:** ۱) هۆندراو، هۆنە؛ ۲) بریەتی لە قسەی هەڵبەستەو درۆ [ف] ۱) بافتە؛ ۲) بهتان.
**بافیش:** بەخۆ هەڵگوتن، تاریفی خۆکردن [ف] خودستائی و لاف و گزاف.
**باڤ:** ۱) باوك، باب؛ ۲) ئامـاڵ، نزیك لە رەنگا: (زەر**باڤ**: ئامالْ زەرد)، واش [ف] ۱) پدری؛ ۲) متمایل به...
**باڤبرا:** برای هەر لەباوك، برای‌بابی، دوکوڕ لە بابێك‌و دودایك [ف] برادر پدری.
**باڤی:** بادام، بەهیڤ [ف] بادام.
**باقاندن:** هاواری جانەوەری وەك ریوی‌و ئەمانە لە نەخۆشی [ف] واق واق کردن.
**باقانن:** باقاندن [ف] واق‌واق کردن.
**باقـر:** ۱) مس؛ ۲) مسی قەلایی لێ‌نەدراو؛ ۳) چێشتی لەمسدا تێك‌چو: (ئـەم چێشتە **باقر**بوە مەیخۆن)؛ ۴) عەیبی نادیاری: (ئاخری **باقری** دەرهـات)؛ ۵) روسیایی‌و ناوزڕان: (ئیستا تەواو **باقر** بوە هەر ئابروی پێوە نەماوە) [ف] ۱) مس؛ ۲) مس سپید ناشده؛ ۳) غذای فاسد شده در ظرف مسی؛ ۴) عیب پوشیده؛ ۵) رسوایی.
**باقـڵ:** وا بیر دەبـەم، وا تێدەگەم، پێم وایە، ولـوْ هزر دبەم، بەبیرا من [ف] حدس می‌زنم.
**باقلاو:** شێوی باقلەو ئاوو رۆن [ف] آش باقلا.
**باقلە:** ۱) دانە وێڵەیە لە کەلودا دەبێ‌و دەنك پان‌و درشتو سورمەیی رەنگە لە لۆبیا دەچی‌و لەو زلترە؛ ۲) بەری گیایەکی گەلا دەرزی کوێستانیە وەك کەما کە «لۆ»ی پێدەڵێن [ف] ۱) باقلا؛ ۲) گیاهی برگ سوزنی.
**باقوُ:** ۱) بز، جۆرێ ماسی لوسی سمێڵداری دەم گەورەیە، شیعە نایخۆن؛ ۲) هەنجیری هێشتـــا نەگەیشتـو؛ ۳) قەزوانی فەریك [ف] ۱) نوعی ماهی؛ ۲) انجیر کال و نرسیده؛ ۳) چاتالنقوش دلمل.
**باقـوُرە:** ۱) بەچکـە بەراز، کودەڵە وەراز؛ ۲) زەبەلاح‌و تەژە [ف] ۱) بچه خوك؛ ۲) لَندهور.
**باقوُفە:** ئەیاغی کرمێ‌و رزیوی میوە [ف] میوهٔ گندیده.
**باقـــە:** ۱) باغـــە، باوەشێك گیا یا دەغلی بەسـراو؛ ۲) واقـەوزیقـەی ریوی‌و...؛ ۳) نەخـۆشیەکـە توشی بزن تێ: (بـاقە بزە کەوتوُسە ناو بزەکانم) [ف] ۱) گیاه بستە؛ ۲) واق‌واق؛ ۳) نوعی بیماری بُز.
**باقەبەس:** ئەو گیایەی باقەی پێ دەبەستن [ف] گیاه مخصوص بستن.
**باقەبەست:** باقەبەس [ف] نگا: باقەبەس.

**باقەبێن:** باقەبەس ف نگا: باقەبەس.
**باقی:** ۱) هەرماو؛ ۲) ماوەی ژمارەو پارە: (چەندم **باقی** دەدەیەوە، دینارم دایتێ **باقیە**کەت نەدامەوە) ف ۱) باقی؛ ۲) باقیمانده.
**باقیە:** تەقەڵ، تیك، (کەوشەکانم جوت **باقیە** کرد) ف بَخیه.
**باك:** ترس: (من لە تیر و تانەوو زیندانو دار **باکم** نیە) «هێمن» ف باك و هراس.
**باکردن:** پەنەمان، ئاوسان، هەڵامسان ف آماسیدن.
**باکوت:** ۱) بەفری بەبا پەستواو، کڕێوە بەبای توندەوە؛ ۲) میوەی با وەراندو ف ۱) برف بادآوردهٔ متراکم؛ ۲) میوهٔ باد ریخته.
**باکوڕ:** بەرانبەری باشوڕ، پشتەو قوبلە ف شُمال.
**باکوڕە:** گۆچان، گۆپال، داردەستی سەرچەمیو ف چوگان.
**باکوڕك:** بای زۆر ساردی زستان، سۆزەی سەرما ف باد سرد زمستانی.
**باکوزیرك:** باو بۆران، توفو کڕێوەو بادەوە ف کولاك و دَمَه.
**باکوقە:** باقوفە، میوەی رزیوی با وەراندو ف میوهٔ باد ریخته.
**باکـەش:** ۱) بایـوێر، کەلـێنێ بای تێدا دێ؛ ۲) کەلـەشـاخی حەجامەت‌کێش، کوپێ کە لە پشتی ئێشاوی دەگرن ف ۱) مَنفَذ باد؛ ۲) بادکش.
**باکەف:** خشتی هەڵکفاوی تەواو لەکڵ دەرنەچو ف آجُر نیم‌پخته.
**باکێش:** باکەش ف بادکش.
**باگا:** شوێنی باگر ف مَنفَذ باد.
**باگ:** با ف باد.
**باگر:** باگا ف مَنفَذ باد.
**باگردان:** بانگوێژ، بانگوش، باگردێن، بان‌گلێر ف بام‌غلتان.
**باگردێن:** باگردان ف بام‌غلتان.
**باگوڕ:** بای توند ف تُندباد.
**باگوێکە:** گێژەڵوکە ف گِردباد.
**باگژە:** بایەکە نێونجی شەماڵو زریان ف باد میانهٔ شمال و جنوب.
**باگوردان:** باگردان ف بام‌غلتان.
**باگوردێن:** باگردان ف بام‌غلتان.
**باگونە:** گون پەنەمان لەبەر قەڵەوی ف آماس خایه.
**باگەڕ:** گێژەڵوکە، گەردەلول، باهۆز ف گِردباد.
**باگێژە:** باگەڕ ف گِردباد.
**بال:** ۱) لەکن، لەلا، لجـەم، با، لنك: (تشتێ من **لبال** تەنە)؛ ۲) چنگێ تەیرا، باڵی‌مەل ف ۱) نزد؛ ۲) بالِ پرنده.
**باڵ:** ۱) دەسـتی باڵـدار، چنگی تەیر؛ ۲) هەرچـوار پەلی گیانـدار: (دەسـرێژیان کرد چوار **باڵ**یان کردم)؛ ۳) لەسەر پەنجەوە تا چەنەگە: (گوریسەکە هەشت **باڵ** بو)؛ ۴) باخەڵ بە ڕاکشاوی: (دەڵێن پیاوی دەبـاڵدا بوە)؛ ۵) تێکەڵاویو نزیکی: (دوماڵ دە**باڵ** یەکدان) ف ۱) بالِ پرنده؛ ۲) چهار دست و پا؛ ۳) از سرِ پنجه تا چانه؛ ۴) آغوش؛ ۵) مُختَلِط بودن.
**باڵا:** ۱) بڵندی، بەرزی؛ ۲) بەژن، قام، قەد ف ۱) بلندی؛ ۲) قَد.
**باڵابـۆست:** باوەعـەمـرە، بستـەباڵا، چڵەنۆك، بەتەمەنی دەباڵانەکردو، باواقوڕەت ف کوتوله.
**باڵابەرز:** بەژن بەرز ف بلندقامت.
**باڵابەرزە:** سێهەم کلك لە پەنجەدا، تلیاناوی، قامکی قوێێ، قامکه قوچه ف انگشت وسطی.
**باڵابەژن:** ئاوێنەی باڵاروان ف آینه تمام‌قد.
**باڵاپۆش:** جلکی سەرتاپایی، عەبا، کەپەنك، وهیتر ف بالاپوش.
**باڵاتە:** ۱) سەرەتای گەیشتنی میوە؛ ۲) نێوی گوندێکە ف ۱) آغاز رسیدن میوه؛ ۲) نام دهی است.
**باڵاخانە:** نهۆمی‌دوەم ف طبقهٔ دوم.
**باڵادەس:** ۱) دەسـەڵات‌دار: (یاخـوا هەر **باڵادەس** بی)؛ ۲) گەورەتر: (سۆرۆ **باڵادەسی** منە) ف ۱) بانفوذ؛ ۲) اَرشد.
**باڵادەست:** باڵادەس ف نگا: باڵا دەس.
**باڵادەستە:** نە درێژ نە کورت، نێونجی ف قدِ متوسط.
**بالار:** کاریتە ف دیرك.
**باڵاڕوان:** ۱) ئاوێنـەی گەورە، نەینکـا مەزن، جامی باڵانـوێن؛ ۲) کولانکەی بان، ڕۆچنەی میچ ف ۱) آینهٔ تمام قد؛ ۲) روزنهٔ بام.
**باڵاشمە:** داری دیرەگی سەرتاقەی دیوار کە داری تری بەسەردا رایەڵ دەکەن ف دیرك تاقچه.
**باڵاشمەمە:** باڵاشمە ف دیرك تاقچه.
**بالافڕ:** فڕۆك، فڕوکە، تەیارە ف هواپیما.
**بالافس:** باڵابۆست ف کوتوله.
**بالاف:** ۱) کوڵ، شیو وکوڵ؛ ۲) خۆ شتن؛ ۳) جلکێ‌دا ندراو بۆ شوشتن: (ئـەو جلکێ هانـا **بالافینە**) ف ۱) رختشوئی؛ ۲) آب‌تنی؛ ۳) رختِ آمادهٔ شستن.
**باڵاکردن:** بەرز بو ن، گەورە بو ن، درێژ بو ن ف بلندشدن، رشد کردن.
**باڵاگەردان:** بەڵاگێڕ، دەسەر گەڕان ف بَلاگردان.
**بالان:** تەڵـە گورگو تەڵـە ریوی: (گورگی **بالان** دیدەیە) ف تلهٔ آهنی گرگ و روباه.
**باڵانوێن:** ئاوێنەی باڵاروان ف آینهٔ تمام قد.
**باڵانی:** ئیستری باب ئەسپی داك ماکەر ف استر پدر اسب.
**باڵباز:** چەکداری میری، سەرباز ف سرباز.
**باڵبەست:** قۆڵبەست ف کَت‌بسته.
**باڵبەستن:** قۆڵ بەست کردن ف کَت بستن.
**باڵبەستە:** قۆڵ بەست کراو ف کَت‌بسته.
**باڵتۆز:** ژن خوشك، خوشکی ژن ف خواهر زن.
**باڵتـە:** ۱) پاڵتاو، باڵاپۆشی ئەستور؛ ۲) بیور، تەور، تەوەر؛ ۳) چەشکە، چەژە ف ۱) پالتو؛ ۲) تبر؛ ۳) طُعمهٔ شکار.
**باڵخەنجەرە:** باڵدارێکە باڵی لە وێنەی خەنجەر هەڵکەوتوە ف پرنده‌ای که بالش شبیه به خنجر است.
**باڵدار:** هەرچێ بفڕێ ف پرنده.
**باڵدان:** ۱) لاواندنەوە؛ ۲) پاڕانەوە ف ۱) نوازش؛ ۲) حراست.
**باڵشمە:** چوار چێوەی دەرکو پەنجەرە ف چهارچوبهٔ در و پنجره.

**بالّغ:** بالّق، بلۆق، تێپەڕکردو لە منالّی، پێگەیشتو، منالّ کە شەیتانی دەبێ ف جوان بە حدّ بلوغ رسیده.

**بالّق:** بالغ ف بالغ.

**بالّگـرتن:** ١) دەحـەوا چون؛ ٢) بۆ بێچوە مەلێ کە تازە نەتوانێ بفڕێ ئەیلێن ف ١) پرواز کردن؛ ٢) پرواز آموختن.

**بالّگرتنەوە:** دەحەواوە چون، فڕین ف پرواز کردن.

**بالّگە:** بالّشت، سەرین، سەنیر ف بالش.

**بالمەمی:** مۆم، شەمێ، شەم، مێو ف شمع.

**بالّمیش:** بنەبڕ، قڕان، قڕکردو، ئاسەوار بڕاو ف فناشُدن.

**بالّنج:** ١) بالگە؛ ٢) ئانیشك ف ١) بالش؛ ٢) آرنج.

**بالّنجەك:** بالگەی بچوك، نازبالّنج ف نازبالش.

**بالّندە:** پەڕندە، مەل، تەیر ف پرنده.

**بالّنگ:** ١) بارونە، گیایەکی بۆن خۆشە، بادرەنگ؛ ٢) جۆرێکە لە تیرەی نارنجان ف ١) بادرنگ؛ ٢) نوعی از مرکّبات.

**بالّنگو:** بارونە ف بادرنگ.

**بالّننە:** هەرچی دەفڕێ ف پرنده.

**بالّنە:** بالّدار ف پرنده.

**بالّو:** هەرچۆنێك بێت، بالّێ، بارێ ف بهرحال.

**بالّوُر:** هێلکەدان لە مریشکدا ف تخمدان مرغ.

**بالّۆرە:** گۆرانی هەلّدانی کچ و کوڕ لە چیا کە هەوایەکی تایبەتی هەیە ف نوعی ترانۀ کُردی.

**بالّۆرێ:** بالّۆرە ف از ترانەهای کُردی.

**بالوعە:** ئەو گۆنجەی کە ئاو بۆ ڕەهەند ئەبا ف مجرای فاضلاب.

**بالوك:** ١) بالوکەی پشتی دەست، بایلە؛ ٢) تاژیلۆکە ف ١) زگیل؛ ٢) آخوندك.

**بالوکە:** ١) بالوك، بالۆکە، چەند قیتکەیە لە پشتی دەست دێ و ژیبکەش نیە؛ ٢) جۆرە کولەیەکی باریکە لانەی زیتە، تاژیلۆکە، تاژی ئەحمەد ڕاوکەرە، ئەسپی پێغەمەر ف ١) زگیل؛ ٢) آخوندك.

**بالۆکە:** بالوکەی پشتی دەست، گەنمە ف زگیل.

**بالّۆگرتن:** هەلّفڕین، فڕین ف پریدن، پرواز کردن.

**بالّول:** ١) ناوی پیاوێکی ناودار؛ ٢) بریەتی لەزانا؛ ٣) بریەتی لە گێلۆکە ف ١) بهلول؛ ٢) کنایە از زیرك؛ ٣) کنایە از هالو.

**بالوّلە:** بابۆلە، تیکەی درێژ لە نان و پێخۆر ف ساندویچ.

**بالّولی:** گوێ نەدەرو شەرکرو بێ باك ف متهوّر و بیباك.

**بالّون:** ١) تورەکەی زەلامی فودراوی پڕ لە گاز کە بە هەوادا ئەچێ؛ ٢) فڕوکە، بالافڕ ف ١) بالون؛ ٢) هواپیما.

**بالّوێز:** بریکاری دەولّەت لە دەولّەتیکی تردا، سەفیر، سپاردەی میری ف سفیر.

**بالّوُیك:** بالۆکە ف زگیل.

**بالـە:** ١) خروکـە، پۆرگ لەپێست، ئاولـە؛ ٢) دەنگی کاریلە ساوا؛ ٣) سوکەلّەی برالە ف ١) آبلە؛ ٢) صدای بزغالە؛ ٣) مخفّف (برالە: برادر).

**بالّە:** ١) دەسکێشی چەرمین؛ ٢) بێلّی ئاسن، پێمەڕە، بێڕ ف ١) دستکش چرمی؛ ٢) بیل آهنی.

**بالّەبان:** ١) دەهۆلّی گەورە؛ ٢) ئێستری زەلام و بەهێز؛ ٣) پیاوی تەژەو زەبەلاح؛ ٤) سەقر ف ١) دُهُل بزرگ؛ ٢) استر گُنده؛ ٣) مرد لَندَهور؛ ٤) چرغ.

**بالّەتە:** بالاّتە ف نگا: بالاّتە.

**بالّـەتەپە:** بالّ لە زەویدانی مەل لە کاتی مردنا، پەلەقاژە، هەلّبزۆقان ف پرپر زدن مرغ در وقت سر بریدن.

**بالّەتەپێ:** بالّەتەپە ف نگا: بالّەتەپە.

**بالّەخانە:** ژور لە نهۆمی بالاّدا ف طبقۀ دوم عمارت.

**بالّەشتە:** بالّنجەك ف نازبالش.

**بالّەشۆڕە:** نەخۆشیەکە توشی مریشك و جوجك دێ بالّ شۆڕ دەکەنەوە ف نوعی بیماری مرغ.

**بالّەشۆڕێ:** بالّە شۆڕە ف نوعی بیماری مرغ.

**بالّـەفـڕە:** ١) بالّ لێکـدانی جوجـەلّـە مەل بۆ فێربونی فڕین؛ ٢) بالّ بەیەکادان لە ناچاری ف ١) کوشش برای پرواز؛ ٢) بهم زدن بال از سر ناچاری.

**بالّەفڕێ:** بالّەفڕە ف نگا: بالّەفڕە.

**بالّەکە:** دەفەی شان، پاڕۆی شان ف استخوان کتف.

**بالّـە کـەو:** لەکـەویان لە داژگیردانی دەغـلّ لەسەر جۆخین بەپێوە ف بیختن گندم در خرمن بەحالت ایستادە.

**بالّەوان:** سەقر، بالّەبان ف چرغ.

**بالّێ:** ١) بالّەدارینەی داوەلّ و بوکەبارانە؛ ٢) هەرچۆنێك بێت، بارێ ف ١) بال چوبی مترسك؛ ٢) بهرصورت.

**بالیشت:** بالّنج، سەرین، بالّگە ف بالش.

**بالیف:** بالگە ف بالش.

**بالّین:** ١) پشتیوانەی دیوار و کۆلّەکە؛ ٢) دارێکە دەیخەنە پشتی دەرگای داخراو ف ١) کمکی دیوار و ستون؛ ٢) چوبی کە پشت در نهند.

**بالّین:** بالّگە، بالیف ف بالش.

**بالّینـە:** رفێدە، شتێکە وەك دوشەکەلّە نانکەر نانی پێ پێـوەدەدا ف بالشتك.

**بالّیۆز:** بالّوێز، سەفیر ف سفیر.

**بالّیۆزخانە:** بنکەی بریکاری دەولّەت لە دەولّەتێکی تر ف سفارتخانه.

**بام:** ١) واش، ئامـالّ، نزیك لە ڕەنگا، ڕەنگ؛ ٢) بلاّ، بلاّن، بهێلّە : (بام وابکـا خۆم دەردی ئەزانم)؛ ٣) بادام؛ ٤) پاشگـر بەواتـا: بیـومـایە: (خـۆزی لەوێ بام)؛ ٥) دەگەلّم، لەتـەکما ف ١) فام؛ ٢) بگذار؛ ٣) بادام؛ ٤) می بود می؛ ٥) با من.

**بامجان:** باینجان، باجانارەش ف بادنجان.

**بامجان فەرەنگی:** تەماتە، باینجانە سورە، باژانا سۆر ف گوجەفرنگی.

**بامرنێ:** نەخۆشی چاوقولّکە، تاعون ف طاعون.

**بامێ:** بامیە، سەوزیەکی کەلو دارە دەچێندرێ ف بامیه.

**بامیە:** بامێ ف بامیه.

**بان:** ١) بانگی نویژ: (مەلابانیدا)؛ ٢) گازی: (**بانی** کە بابیّ)؛ ٣) لای سەرو: (لە**بان**ئەو کیفە)؛ ۴) سەربانی خانو؛ ۵) بانو، زەمینی دەشتو بلند: (**بان** هوّ بەتو، تالەبان)؛ ۶) هوگرو خاوەن بەزەیی: (ئەو مانگایە لە گویلکەکەی نە**بان** بوە)؛ ٧) ببن، بوْن ف ١) اذان؛ ٢) صدازدن؛ ٣) طرفِ بالا؛ ۴) بام؛ ۵) فلات؛ ۶) مأنوس؛ ٧) باشید.

**باناندن:** بێچوی بیّ‌دایك خستنە بەر دایکێکی تر (بانین: کاری بانوّك) ف الفت دادن بچهٔ حیوان به حیوان دیگر.

**بانبارگە:** بەربوك، ئەوژنەی دەگەڵ بوك دەچێتە ماڵی زاوا، پاخەسو ف ینگهٔ عروس.

**بانبانك:** جانەوەریکە لەتیرەی سموّرە دەست کورتو قاچ‌درێژە لە رەوەزە بەرداندا دەژی ف جانوری از تیرهٔ سمور.

**بانهوشین:** خشڵێکی ژنانە لەسەری دەدەن ف زیوری است که برسر زنند.

**بانتلیّن:** باگردان، بان‌گلیّر ف بام غلتان.

**بانجیلە:** ١) بانجیڵە، هەیوانی بیّ‌بانی هاوینە بوّشەو لەسەرنوستن؛ ٢) هەربانێکی نەویو چکوڵە وەك بانیژەی ئاش ف ١) تراس؛ ٢) هر بام کم‌ارتفاع و کوچك مانند بامك آسیا که گندم بر آن ریزند.

**بانجیڵە:** بانجیلە ف نگا: بانجیلە.

**بانسەر:** خەملو خشڵێکی ژنانە لەسەری دەدەن، لاسەرە ف زیوری زنانه.

**بانشـــان:** ١) چاروکـــەی شان‌پوّش؛ ٢) قەڵادوّشـە، نیوان‌شان ف ١) شانه‌پوش؛ ٢) میانِ کتف.

**بانق:** شوینی داوستەدی پولو پارە، بانگ ف بانك.

**بانقوّ:** جوّرێك قوماری پەڕانە، بانك ف نوعی قمار با ورق.

**بانك:** بانق ف بانك.

**بانگ:** ١) بانق؛ ٢) بانگی نویژ؛ ٣) گازی: (**بانگم** کرد گویّت لیّ‌نەبو)؛ ۴) بانقـوّ؛ ۵) گریانی شیوەن: (بوّیان لە **بانگیّ**دا) ف ١) بانك؛ ٢) اَذان؛ ٣) صدا؛ ۴) نوعی قمار با ورق؛ ۵) شیون و زاری.

**بانگاف:** نیّوان روّژاواو خەوتنان ف میان مغرب و عشا.

**بانگاواز:** بەقەو هەراکردن ف فریادزدن.

**بانگدان:** بانگی نویژ گوتن ف اذان گفتن.

**بانگدەر:** بانگویژ، ئەوەی بانگی نویژ ئەخوێنیّ ف مؤذّن.

**بانگروّز:** خلوّر، توّتوز، گلار: (لەوبانەوە **بانگروّز** بومەوە)؛ خلیّر، تلیّر ف غلت.

**بانگ کردن:** گازی کردن، گاسی کردن ف صدا زدن.

**بانگردیّن:** باگردان ف بام‌غلتان.

**بانگلیّر:** باگردان ف بام‌غلتان.

**بانگوش:** ١) باگردان؛ ٢) باگردان گیّڕ ف ١) بام‌غلتان؛ ٢) بام‌غَلتان گردان.

**بانگویّڕ:** باگردان ف بام‌غلتان.

**بانگویژ:** بانگ‌دەر ف مؤذن.

**بانگـەڕ:** ١) باگردان؛ ٢) پیاوی بانگێڕ ف ١) بام‌غلتـان؛ ٢) کسی که بام‌غلتان را بر بام می‌گرداند.

**بانگەڕان:** بانگەڕ ف نگا: بانگەڕ.

**بانگەشە:** شاتو شوت ف لاف و گزاف.

**بانگەواز:** بانگاواز ف فریاد.

**بانگ هەڵدان:** شیوەن بەدەنگی بلند ف گریه و شیون با صدای بلند.

**بانگ هیّشتن:** بوّ نان خواردنو بەزمو شایی خواستن ف دعوت به جشن.

**بانگیّڕ:** ١) کەسیّ کە باگردان ئەگێڕیّ؛ ٢) باگردان ف ١) آنکه بام غلتان می‌گرداند؛ ٢) بام غلتان.

**بانگیّشتن:** بانگ هیّشتن ف دعوت به‌سور.

**بانگین:** هەرەبلند، بەرزتر ف بلندترین.

**بانما:** ئامرازی شاندەری باهاتن، باپیو ف بادسنج.

**بانماڵ:** بەفرماڵ، کەسیّ بەفر پاروّ دەکا ف برف‌روب.

**بانو:** ١) دەشتی بەرز، بان؛ ٢) کەیوانوی ماڵ، ژنی بەڕیّز ف ١) فلات؛ ٢) بانو.

**بانوّك:** کەسیّ بێچوی دایك مردو دەخاتەوە بەر دایکێکی‌تر ف آنکه دام مادر مرده را به حیوان دیگر عادت دهد.

**بانە:** ١) ئەو هیّلانەی پیّش توّم چاندن جوتیّر خانەخانەی پیّ‌دیاری دەکا تا سنـوری توّ چانـدنەکە دیاری بیّت؛ ٢) لەوەڕگەی بەهارانە بەر لە چونـــی زوّزان؛ ٣) بلنـــدایی نیّوان دو دیّراوی ئاودیّری؛ ۴) موی توُکـــەبـــەر؛ ۵) هاوینـــە هەوار؛ ۶) ناوی شاریّكو مەلبـــەنـدیك لە کوردستـــانـدا؛ ٧) دەشتـایی بلنـدتـر لە دەورو بەری خوّی ف ١) فواصلی که برای تخم‌پاشی روی زمین می کشند؛ ٢) مرتع بهاری قبل از ییلاق؛ ٣) بلندی میان دو جوب؛ ۴) موی زهار؛ ۵) ییلاق؛ ۶) اسم شهری در کردستان؛ ٧) فلات.

**بانەگا:** بەرگەدە، جیّگەی لیّ‌ڕوانی توُکەبەر ف زهار، شرمگاه.

**بانەمەڕ:** ١) هاوینە هەوار؛ ٢) دوهەمین مانگی سالّ، مەهیّ گولان ف ١) ییلاق؛ ٢) ماه دومِ سال.

**بانەناو:** سواغ، قورتیّ هەڵسون، سیواق ف گل اَندود.

**بانەوبان:** بازدان لە بانیّکەوە بوّ بانیّك ف پرش از بامی به بامی دیگر.

**بانی:** دەشتی بەرز، بانو، بان ف فلات.

**بانیژە:** ١) ئەو جیّگەی گەنمی باراشی لیّ‌روّ دەکەنو لەویّوە دەڕژیّتە گەرو لەبـوّ بەرداش؛ ٢) هەمـو سەربـانیّکی نەویو چکـوڵە ف ١) بامكِ آسیاب که از آنجا گندم به گلوی آسیاب می‌ریزد؛ ٢) بام کوچك.

**بان‌یەك:** لەسەر یەکتر، کەڵەکە ف برهم انباشته.

**بان یەك نان:** کەڵەکە کردن، لەسەریەك دانان ف بر هم نهادن.

**بانین:** کاری بانـوّك، وەبـەرخستنی بیّچو بەر دایکی نەبانو بیّگانە ف عادت دادنِ دامِ مادر مرده به حیوانِ دیگر.

**باو:** شیّوە، ئامـــاڵ، واش: (پـارچـەکـە رەش **باوە**، شین**باوە**)؛ ٢) پاڵ، تەکـانـدان: (**بـاو**یّك بە جوّلانەوە نیّ)؛ ٣) وشەیەکە بوّ گەمە دەگەڵ منداڵ دەگوتریّ: (بەچەکە **باو**! **باوباویّن** دەکەین)؛ ۴) باب، باف؛ ۵) رمیّنو رەونەق: (تیروکەوان لە**باو**کەوتوە)؛ ۶) هەل، دەرفەت: (**باوباوی**

تۆبو نەت‌کرد لەدەستت دا)؛ ۷) هێزو قەدو باڵا: (هەر لە تەمەنێکدا این بەڵام ئەو لەمن **باو** خۆشترە)؛ ۸) خول‌و سوڕی توند: (خول خولەکەم باش **باو**دەخوا)، («**باوەخولێ**»: گەمەیەکی منالانەیە)؛ ۹) شیاو: (ئەم گۆشتە **باو** دیانی من نیە)؛ ۱۰) هەرەت، جەنگە، تاف؛ ۱۱) وەرە، بێ ف ۱) فام؛ ۲) هُل دادن؛ ۳) کلمه‌ای که هنگام بازی با بچه‌ها گویند؛ ۴) پدر؛ ۵) رونق؛ ۶) فرصت؛ ۷) رشد و نمو؛ ۸) چرخیدن سریع؛ ۹) شایان؛ ۱۰) عُنفوان؛ ۱۱) بیا.

**باوئیرك:** گەوی مس یا ئاسن، ئاڵقەی مسین یا ئاسنین ف حلقهٔ مسی یا آهنی.

**باوا:** ۱) باپیر، کالك، («**باواگەورە**»: بابی باب‌و بابی دایك)؛ ۲) باب ف ۱) پدربزرگ؛ ۲) پدر.

**باواقۆرەت:** چلەنۆك، باواعەمرە ف کوتوله.

**باواگەورە:** باوکی باپیر، باپیرە گەورە ف جدّ پدری.

**باوام:** بادام، بەهێڤ، باڤی ف بادام.

**باوان:** ۱) ماڵەبابی ژن‌و بوك؛ ۲) لەلای ئەوان، لنك‌وا ف ۱) خانهٔ پدری؛ ۲) نزد آنان.

**باوانی:** جیازی بوك، ئەوەی بوك بۆ ماڵە زاوای دەهێنێ ف جهازِ عروس.

**باوالێ:** وشەی خوەشەویستی‌و ڕێزلێ نان بۆ باب ف حرف محبت و احترام به پدر.

**باوباوێن:** گاڵتە دەگەڵ منالاکردن‌و باوباو گوتن ف شوخی کردن با کودك.

**باوبڕ:** ۱) تۆزو غومار، تۆزو خۆڵ، غومارێ‌که با دەیهێنێ؛ ۲) قوڕەی زگ‌و تڕو تس ف ۱) گرد و غبار؛ ۲) کنایه از باد شکم.

**باوجو:** ئەگەرچی، هەرچەندە، دەگەڵ ئەوەشڕا ف باوجود، هرچند.

**باودیان:** ڕەوای ددان، شیاوی دگان ف باب دندان.

**باوڕ:** بڕوا، یاقیدە ف باور، عقیده.

**باوسەندن:** ۱) وەبرەو کەوتن، وەڕەواج کەوتن؛ ۲) وەسەر کەوتن بەرسەرغەنیم‌دا؛ ۳) سوڕخواردنی بەتەوژم ف ۱) رواج یافتن؛ ۲) ظفر یافتن؛ ۳) بشدّت چرخیدن.

**باوسەنن:** باوسەندن ف نگا: باوسەندن.

**باوش:** باوەش، هامێز، ئامێز ف آغوش، بر.

**باوشك:** باوێشك، دەم داچەقاندن لەبەر خەوهاتن ف خمیازه.

**باوك:** باب، باڤ ف پدر.

**باوکە:** ۱) نێرەی باڵدار کاتێ جوجەڵەی هەیە؛ ۲) بانگ‌کردنی باب: (**باوکە**! کەوشم بۆ بکڕە) ف ۱) پرندهٔ نر هنگامی که جوجه داشته باشد؛ ۲) کلمهٔ خطاب به پدر.

**باوکەڕۆ:** وشەی شیوەن‌و خەمباری ف کلمهٔ شیون و نوحه.

**باوکەلێ:** وشەی خۆشەویستی‌و نازداری: (**باوکەلێ** بۆ دیارت نەبو) ف کلمهٔ مَحبّت و نوازش.

**باوگ:** باوك ف پدر.

**باوگەوازی:** شەڕە جنێو، جوێن بەیەکدان ف دشنام بهم دادن.

**باول:** جانتا، چەمەدان، سندوقی لە چەرم‌و مقەبیا بۆ جلك تێنان ف چمدان.

**باوڵ:** نەخۆشی چۆکی بێچوی ئاژەڵ ف بیماری زانوی بره و بزغاله.

**باوەپیارە:** زڕباب، بێگانەی مێردی دایك ف ناپدری.

**باوەت:** بابەت ف بابت.

**باوەخولێ:** سوڕخواردن بەدەوری خۆدا ف بەدور خود چرخیدن.

**باوەخون:** جونەوەی بوك بۆیەکەمجار بۆماڵی باوك ف اولین بازدید عروس از خانهٔ پدر.

**باوەخۆن:** باوەخون ف نگا: باوەخون.

**باوەڕ:** ۱) باوڕ، بڕوا، باوەڕی؛ ۲) سنوری نێوان دوزەوی، کەوشەنی دوکێڵگە ف ۱) باور؛ ۲) مرز بین دو کشتزار.

**باوەر:** ۱) بهێنە، وەرێنە؛ ۲) جۆگەی ناوەغڵ ف ۱) بیار؛ ۲) مسیر آب در کشتزار.

**باوەڕپێکراو:** ئەمین، جێ باوەڕی ف اَمین، جای اعتماد.

**باوەڕنامە:** پسولەی گەوایی خوێندن، گەواهینامە ف کارنامهٔ تحصیلی.

**باوەرماڵ:** پاك کردنەوەی لیتەی ناو جۆگە ف لجن‌مالی جوب.

**باوەرە:** باوەر، بهێنە، بێرانە ف بیار.

**باوەرێن:** میوەی کە با وەراندویە ف میوه باد ریخته.

**باوەژن:** هەوێی دایك، ژن‌باڤ، زڕدایك ف نامادری.

**باوەش:** باوش ف آغوش.

**باوەشێن:** بارۆشە ف بادبزن.

**باوەعەمرە:** چلەنۆك، باڵابۆست، باواقۆرەت ف کوتوله.

**باوەقۆت:** باوەعەمرە ف کوتوله.

**باوەقۆرەت:** باوەقۆت ف کوتوله.

**باوەڵ:** ۱) باوڵ؛ ۲) بێچوی ئاژەڵێ کە توشی باوەڵی بوبێت ف ۱) بیماری زانوی برّه و بُزغاله؛ ۲) برّه و بزغاله مریض.

**باوەلێ:** ۱) نازناوە بۆ سەیدان: (چومە خزمەت **باوەلێ** بۆ زیارەت)؛ ۲) پیری پەك کەوتو: (**باوەلێ** بایەکی بەسە)؛ ۳) جۆرێ نەخۆشی ئاژاڵ ف کلمهٔ خطاب به سادات؛ ۲) پیر و فرتوت؛ ۳) نوعی بیماری احشام.

**باوەڵی:** نەخۆشیەکە توشی ساوای ئاژەڵ دەبێ‌و ئەژنۆی دەپەنەمێ ف بیماری زانوی برّه و بُزغاله.

**باوەگۆ:** قسە دەقسە داکەر، کەسێ لەناو قسەی یەکی‌ترا هەڵدەداتێ ف کسی در میان سخن دیگری بپرد.

**باوەگێژە:** باوەخولێ ف نگا: باوەخولێ.

**باوی:** ۱) بادام؛ ۲) نەخۆش بەدەردی باداری، بادار ف ۱) بادام؛ ۲) مبتلا به رماتیسم.

**باوێ:** باوێژە ف بینداز.

**باوێزە:** باوەرێن، ئەومێوەی کەبا لەداری وەراندوە ف میوهٔ باد ریخته.

**باوێشك:** باوشك ف خمیازه.

**باویلکە:** پشیلە پایزە، گیایەکە تۆکەی سپی‌و سوك‌و گرژنە پایزان با بڵاوی دەکاتەوە، بایلکە، شەلەمین‌کەرە ف گُل قاصد، قاصدك.

**باوێلی:** باویلکە، بایلکە، پەپولەپایزە ف گُل قاصد، قاصدك.

**باهو:** ۱) قوڵ، کوڕ؛ ۲) وارشی دیوار یان خەندەکی دەوری باغچە؛ ۳)

لاشیپانەی درگا؛ ۴) ئاڵوداری دارەڕا؛ ۵) شاهێنی تەرازو؛ ۶) ئاسۆگ، کەناری ئاسمان؛ ۷) شان‌و پیل ف ۱) ژرف؛ ۲) خَنْدَقْ؛ ۳) دوطرفِ طولی چهارچوبۀ در؛ ۴) تیر سقف؛ ۵) شاهین ترازو؛ ۶) اُفُق؛ ۷) کتف.

**باهۆ:** شان‌وپیل: (ئەلا ئەی نازەنین ئاهو بە **باهۆ** / دڵی سەییادی خۆت هێنایە لەرزە) «نالی» ف کتف.

**باهۆدار:** زەلام‌و بەهێزو تاقەت ف تنومند و نیرومند.

**باهـور:** وڕەبا، هۆڕەبا، بای زۆرساردی توند بەمژەوە ف بادِ سرد و سخت همراه با مه.

**باهۆڕ:** باهوڕ ف نگا: باهوڕ.

**باهۆز:** گەردەلول، گێژەڵوکە ف گِردباد.

**باهەڵکردن:** باهاتن ف وزیدن.

**باهەنجیـر:** باتسکە، جۆرێ‌هەنجیـری زۆر خراپ ف نوعی انجیـر نامرغوب.

**باهێر:** ۱) زەمینی نەکێڵدراو؛ ۲) سەرگەردان‌و سەرلێ شێواو ف ۱) زمین بایر؛ ۲) سرگردان.

**باهیڤ:** بادام ف بادام.

**باهیڤۆك:** پەنەمینی قاچ لەبەر ماندویی. ئاوسانی پا لەماندگی ف آماسِ پا از فرطِ خستگی.

**بای:** ۱) شەمچـە، شخـاتە، شقاڵتە، کرمیت، گۆگرد، شقارتە؛ ۲) نرخ، قیمـەت، بایی؛ ۳) ببـی: (قیبلەم سوپـەردەی وەیسی نازاربـای) «سەیدی» ف ۱) کبریت؛ ۲) نرخ؛ ۳) باشی.

**بایام:** بادام ف بادام.

**بایباڵدان:** گەڕان لەدەشت‌و دەر بۆ حەسانەوەو خەمڕەواندن ف تَفَرُّج.

**بایجان:** بامجان، باینجان، باجان ف بادنجان.

**بایدە:** بادیە، زەرکی ئاوخواردنەوە ف ظرفِ آبخوری.

**بای دەبور:** بای‌خۆر ئاوایی ف دَبور، بادِ مغرب.

**بایر:** زەمینی نەکێڵدراو، بور، بەیار، کۆدە ف زمین بایر.

**بایز:** سوکەڵەناوی بایزید ف مخفّف بایزید.

**بایس:** هۆ، سەبەب، باعیس ف سَبَبْ.

**بایست:** بایس ف سَبَبْ، علّت.

**بایستی:** بایس ف سَبَبْ.

**بای‌سور:** نەخۆشیەکە، بای ممبارەك ف بادِ سرخ، نوعی بیماری.

**بای‌فەرەنـــگ:** ئاگرە، ئاورە، زیپکـەو پۆرگ کە لە دەم‌و چاو دێت ف آتشِ فارسی.

**بایلە:** ۱) بالوك، بالوکە؛ ۲) پارچە قوماشێکی زۆر تەنکە ف ۱) زگیل؛ ۲) نوعی پارچه بسیار نازك.

**بایلکە:** باویلکە، پسیلەپایزە ف قاصدك.

**باینجان:** بامجان، باجان ف بادنجان.

**باینجانی:** رەنگی باینجان، سورمەیی تاریك ف بەرنگ بادنجان.

**بایە:** بادیە، زەرکی ئاوخواردن لەمس یا لەدار ف ظرفِ مسی یا چوبی آبخوری.

**بایەخ:** قەدرو ئیحتوبار، گرینگی ف ارزش، قدر.

**بایەف:** فەریکە بادام، چەقالە بادام ف چغالەبادام.

**بایەقوش:** کوندەبو، کوننەبەبو ف بوف کور.

**بایەو:** بایەف ف چغالەبادام.

**بای‌هەوا:** بادیهەوا ف مُفت.

**بایی:** ۱) بەفیزو لەخۆگۆڕاو: (لەوەتا دەوڵەمەندە **بایی بوە**)؛ ۲) بادام؛ ۳) نرخ، قیمەت ف ۱) متکبّر؛ ۲) بادام؛ ۳) نرخ.

**ببا:** ۱) ئەگەر وابو با؛ ۲) بیبا، بیوا ف ۱) اگر چنان می‌شُد؛ ۲) بِبَرَد.

**ببام:** وابومایە، وابوایتم ف بودمی.

**ببان:** وابوایتن ف بودندی.

**ببڕ:** ۱) بڕندە؛ ۲) بەبڕشت‌و هێزدار: (لەم ناوەدا بکوژو **ببڕهەر خۆیەتی**)؛ ۳) فەرمانی بڕین: (حەوجار بگر، جارێك‌ببڕ) ف ۱) بُرّا؛ ۲) بزن بهادُر؛ ۳) اَمر به بُرش.

ببڕای: بەهیچ‌جۆر، هەرگیز: (**ببڕای ببڕای** ناچمەوە گوند) ف هرگز، ابداً.

**ببڵە:** بێچوی تازەزاو، ساوا، کۆرپەساوا ف نوزاد.

**ببوایتن:** دەبون ف می‌بودند.

**ببواین:** دەبوین ف می‌بودیم.

**ببوایە:** بوایت ف می‌بود.

**ببونایە:** ببوایتن ف می‌بودند.

**ببە:** بوە، فەرمانی بردن ف امر به بُردن.

**ببیە:** ببیسە، گوێ‌بگرە ف بشنو.

**ببێ:** ۱) ببێژە؛ ۲) هەبێ، دژی نەبێ ف ۱) بگو؛ ۲) باشد.

**بت:** ۱) خودای دەسکرد؛ ۲) پێشگرێکە: (**بت‌خۆم، بتگرم**) ف ۱) بُت؛ ۲) پیشوند بەمعنی تُرا.

**بت‌پەرس:** کەسێ خوای دەسکرد بپەرستێ ف بُت‌پرست.

**بت‌پەرست:** بت‌پەرس ف بُت‌پرست.

**بتخانە:** شوێنی بتان ف بُتخانه.

بتر: ۱) پتر، زیاتر، بێتر؛ ۲) هەراشتر، زوتر هەڵدان‌و بەخۆداهاتن ف ۱) بیشتر؛ ۲) رشید، بالنده.

بتری: شوشەی تراو تێ‌کردن؛ بوتری، بوتل ف بطری.

**بتەو:** پتەو، مەحکەم، توندو قایم، خۆگر ف محکم.

**بتی:** پور، میمك ف عَمّه، خاله.

**بجم:** ببزو، بجولێ ف حرکت کن.

**بچڕان:** پسان، قوت‌بون، قەتیان، قرتیان ف گُسستن.

**بچڕاندن:** قەتاندن، پساندن، قوت‌کرن، قرتاندن ف قطع کردن.

**بچـڕك:** ناوسـاجی، زلوبی، نانێکە لە ناو رۆنا سوری دەکەنەوە، کولێرە بەرۆن ف گردۀ روغنی، چَلپَكْ.

**بچرك:** بچڕك ف گردۀ روغنی، چربك.

**بچڕیان:** بچڕان ف گُسستن.

**بچڕین:** پساندن ف قطع کردن.

**بچکۆك:** چکۆڵە، بیچك، بچوك، کەم قەوارە، گچکە ف کوچك.

**بچکۆڵ:** بچکۆك، دەبێتەناو بۆکوڕان ف کوچك.

**بچکۆلانه:** بچکۆك ف کوچولو.

**بچکۆلە:** بچکۆك ف کوچولو.

**بچکه:** ١) بچکۆك؛ ٢) بێچو ف ١) کوچولو؛ ٢) بچّه.

**بچکەلانه:** بچکۆك ف کوچولو.

**بچکەلە:** بچکۆك ف کوچولو.

**بچۆ:** فەرمانی ڕۆیشتن، بڕۆ ف برو.

**بچوچك:** چکۆلە ف کوچك.

**بچـوُك:** ١) بچکۆك؛ ٢) بەپلە کەمتر: (کوڕی من **بچوکی تۆیه**) ف ١) کوچك؛ ٢) خدمتگزار.

**بچـوکی:** کەم قەوارەیی، خزمـەتکـاریو نۆکەری: (تا دەمرم **بچوکیت** دەکەم) ف خدمتگزاری.

**بچۆله:** بچکۆك ف کوچك.

**بچەنگانێ:** ئامبازبون، مل دەبەرمل نان، دەستەملان ف گلاویزشدن.

**بختیان:** قسەی هەڵبەسته، تۆمەت، بوختان ف بُهتان.

**بخۆ:** ١) فەرمانی خواردن؛ ٢) هەربۆخوی، لەخۆوه ف ١) بخور؛ ٢) خودبخود.

**بخۆر:** زۆرخۆر، خۆرا ف پُرخور.

**بخوُر:** سوتەنی بۆنخۆش ف بخوُر.

**بخوُز:** گای خەفۆك، گایەك کە لەکاتی جوت کردندا ئەخەفێ ف گاوی کە در اثنای شخم می‌خوابد.

**بخه:** ١) بهاوێژه، یاوێژه؛ ٢) پێدابماڵه: (چەقۆ لە هەسان **بخه**با تیژبێ) ف ١) بینداز؛ ٢) بمال.

**بخێری:** بوغاری، ئاگردانێ دوکەڵی لەسەربان بڵاوبێت، مغاری ف بُخاری.

**بدوُ:** قسەزانو دەم پاراو ف سخنور.

**بده:** ١) بەهـرەو داهـات، دەرامەت؛ ٢) باجو پیتاکی میری؛ ٣) فەرمان بەواتـا: (وەده، ببەخشه)؛ ٤) بەواتای دەهنده ف ١) درآمد؛ ٢) باج و خراج؛ ٣) *فعل اَمر* بده؛ ٤) دهنده.

**بدەر:** ١) دەهنده: (کابرایەکی نانبدەره)؛ ٢) بده، وەده، بدەیه: ٣) برێتی لەژنی بێشەرم ف ١) دهنده؛ ٢) بده؛ ٣) کنایه از زن بی‌شرم.

**بدیه:** بڕوانه، تەماشاکه ف ببین.

**بڕ:** ١) کەمێك: (بڕێك ئاوم دەیه، ئەو بڕەچیه دەمدەیەی؟)؛ ٢) قەڵتەدارێکی بڕاو: (دوبڕداربێنه)؛ ٣) ساڵ لەتەمەنی یەکسمدا: (جوانوەکەیەك بڕه یان دوبـڕه؟)؛ ٤) تابشتو هێز: (بڕناکەم لەم کێفە سەر کەوم، لەگریوە غاردا بڕی نەکـرد)؛ ٥) دەستـەو کەرت: (بڕە مەڕێك هات، توشی بڕە پیاوێ بوم)؛ ٦) تیرەو تایفـه: (بـرا تۆ ئێژی جافم لەکـام بڕی؟)؛ ٧) داپـاچینو لەت کردن: (قـەڵتو بڕی تێخستن، دارەکـانی قەڵتو بـڕکـرد)؛ ٨) پاشگری بەمانا بڕنـده: (جاران داربـڕبو ئێستـا بویته میری سەربڕ)؛ ٩) پاشگری بەمانا کونتێکەر: (دز بەماڵبڕدیوارەکەی بڕیوه)؛ ١٠) دڕانـدنی پارچە بەقەیچی یان بەدەست: (حەوجار بگر جارێك ببڕ)؛ ١١) قوتارکەر: (ئەم هەتیوە ئانودۆبڕبو)؛ ١٢) بڕشتو کار ڕاپـەڕاندن: (زۆر پیاوێکی بەبڕه)؛ ١٣) گۆترە بێ‌پێوانو ژمار: (بەری ئەم گوێزە لە بڕ بەچەنده؟)؛ ١٤) قەبەڵو یەکجارەکی: (ئەم خانوەم لەبڕ بەکـردن داوه)؛ ١٥) بواری ئاو: (ئەم روبارە بڕنادا)؛ ١٦) دەسکاری پەڕی قومار: (بڕی لێده)؛ ١٧) لەگەل دور کەوتو: (ئەم گیسکە لەمێگەل بڕ بوه)؛ ١٨) بەزۆر خستنـەنـاو: (داریان تێ بڕی)؛ ١٩) دژی وشك: (کـراسەکەم تەڕو بڕه) ف ١) اندکی؛ ٢) قطعهٔ بریدهٔ چوب؛ ٣) یك سال در عمر چهارپایان؛ ٤) توان؛ ٥) دسته و گروه؛ ٦) تیره و عشیره؛ ٧) قطع کردن؛ ٨) پسـونـد بەمعنی بُرنـده؛ ٩) پسـونـد بەمعنی سوراخ‌کُننـده؛ ١٠) بریدن پارچـه؛ ١١) از بین برنـده؛ ١٢) بُرش، قاطعیَّت؛ ١٣) رویهم؛ ١٤) کُنتـراتی؛ ١٥) گُدار آب؛ ١٦) بُرزَدَن اوراق پاسور؛ ١٧) از جمع جا مانده؛ ١٨) بەزور جادادن؛ ١٩) خیس.

**بڕا:** ١) بڕدرا بەتیخ یان بە تەورو هەرچی: (بـەتـەور دارەکـه **بڕا**)؛ ٢) خەلاس بو، کۆتایی هات: (نانمان لەماڵ **بڕا**، مانگا مردو **دوبڕا**) ف ١) قطع شد؛ ٢) تمام شُد.

**برا:** ١) نێرینـەی هاودایكو باو یان هاویەك لەوان، برێ؛ ٢) بردرا، دژی هاوردرا ف ١) برادر؛ ٢) بُرده شُد.

**برابا‌ب:** نێرینەی هاوباب‌و دایك جیا ف برادرِ پدری.

**برابەش:** هاوبەش لەماڵی دنیادا، دۆستی زۆر نزیك ف سهیم در میراث.

**براتوُته:** قامکی پەناقامکە چکۆلە ف انگشت بنصر.

**بڕاده:** خاکەمرمەند، وردەئاسنی بڕبەند لێدراو ف بُراده آهن.

**برادەر:** دۆستی نێر، دەستەبرا ف دوست، رفیق.

**برادەری:** دۆستایەتیو هەواڵەتی پیاو ف دوستی.

**برازا:** فرزەندی برا، زارۆیبرا، برازی ف برادرزاده.

**برازازا:** نەوەی برا ف نوهٔ برادر.

**برازاڤا:** برازاوا، یاریدەری زاوا لەکاتی بوك گوێزانەوەدا پشتێنەی بوك ئەو دەیبەستێ ف ساقدوش.

**برازاگ:** برازا ف برادرزاده.

**برازاوا:** برازاڤا ف ساقدوش.

**برازه:** نویڵ، لۆسه، باری، باریه، مەڵغه، لەوازه، دەلەم ف دیلَم، اَهرُم.

**برازی:** برازا ف برادرزاده.

**براژتن:** برژاندن، کەواوکردن، بریانکردن، بۆدانی دانەوێڵە لەسەر ساج ف بریان کردن، بودادن.

**براژن:** ژنی برا ف زن برادر.

**براشتن:** براژتن، بۆدان ف بریان کردن، بودادن.

**براشتی:** برژاو، بریان کراو، بۆدراو ف بریان شده.

**براکێ:** برادەر، دۆستی نزیکی نێر ف دوست و برادر.

**براکه:** وشەی خۆشەویستی بۆ دواندنی برادەر ف حرفِ نوازش دوستانه.

**براڵو:** ئاڵۆباڵۆ، بەلاڵوك، هەلهەلوك ف آلبالو.

**براڵوك:** بەلاڵوك، ئالو بالو ف آلبالو.

**براڵوی:** براڵو ف آلبالو.

**براله:** ١) وتەی خۆشەویستی بۆ دواندنی برادەر؛ ٢) ناوی گیایەکه ف ١) کلمهٔ محبّت‌آمیز دوستانه؛ ٢) گیاهی است.

**برام:** ١) برای من؛ ٢) بردیانم، بریام ف ١) برادرم؛ ٢) برده شدم.

**برامازگ:** بەرێکە لە بەری دارمازو ف بُزغَند.

**براماك:** برای هەرلەدایك لەباو نا ف برادر مادری.

**بڕان:** ١) دوایی هاتـن؛ ٢) جودایی: (لێك بڕان)؛ ٣) گەیشتن: (میراتت چەند پێ بڕا؟، ئەوکیژو کورە پێك بڕان)؛ ٤) دابڕین، لەت بون ف ١) پایان یافتن؛ ٢) جدائی؛ ٣) نصیب شُدن؛ ٤) قَطع شدن.

**بڕاندن:** بڕین ف قطع کردن.

**بڕانە:** ١) جیرەو موچەی دیاری کراو؛ ٢) باج و پیتاکی ساڵانەی میری ف ١) مستمرّی؛ ٢) باج و خراج ساڵانە.

**بڕانەوە:** بڕیانەوەو کۆتایی هاتن؛ ٢) لەت بونی دارو... بە مشارو تیغو... ف ١) تمام شدن؛ ٢) قطع شُدن.

**برایانە:** وەك برا ف برادروار.

**برای توتە:** براتوتە ف انگشت بنصر.

**برایەتی:** ١) برابون؛ ٢) خۆشەویستی و رەفتاری برایانە ف ١) و ٢) برادری.

**برایی:** برایەتی: (برامان برایی کیسەمان جیایی) ف برادری.

**بڕبانە:** پیاوی زەبەلاح و تەڕە، زلی ناقۆڵا ف مَرد لندهور و بدقیافه.

**بڕبڕ:** ١) کەم کەم، تۆزە تۆزە؛ ٢) لەت لەت، زۆر پارچەی بڕاو ف ١) کم کم؛ ٢) پارچه پارچه.

**بڕبڕاگە:** مۆغەرەی پشت ف ستون مهره‌ها.

**بڕبـڕە:** ١) بڕبـڕاگە؛ ٢) بڕبڕ؛ ٣) داسی ددانەدار وەك هەڕە؛ ٤) خزمی نزیك ف ١) ستـون فقـرات؛ ٢) کم کم؛ ٣) داس دنـدانـه‌دار؛ ٤) خویشاوند نزدیك.

**بڕبـون:** جیابونەوەو ئاوەکی بون: (مەڕ لەگەلە بڕبوە) ف جُداشدن و از جمع بُریدن.

**بڕبەند:** مڕمەند، ئامرازی ئاسن ڕنین، موروت ف سوهان.

**بربەنگ:** بربەند ف سوهان.

**بڕپێدان:** قسە لەقسەدا کردن ف در میان سخن آمدن.

**برج:** ١) مزلگـەی ڕۆژ لەعاسمان؛ ٢) مانگی ساڵ؛ ٣) قۆنگرەی قوتی قەلا ف ١) و ٢) و ٣) بُرج.

**برجی پیرێژن:** دومین حەوتـەی رەشـەمـە کە زۆر ساردە ف بردالعَجوز، سرمای پیرزن.

**برچی:** برسی، نیز، دژی تێر ف گُرسنه.

**برچەبرچ:** دەنگی قولتە قولتی ئاو ف صدای غلیان آب.

**برچینی:** برسیاتی، برسیەتی، نیزی ف گرسنگی.

**بڕدان:** جیاکرنەوەی هێندێ لەهێندێ ف جُداکردن.

**بردن:** ١) برن، بەرانبەری هێنان؛ ٢) بریەتیەلە تێڕاکردن ف ١) بُردن؛ ٢) سپوختن، درآمیختن.

**بردنەبەست:** تەنگ پێ هەڵێنان، تەنگە تاوکردن ف در تنگنا قرار دادن.

**بردنەسەر:** ١) بەئاکام گەیاندن، ئەنجامدان؛ ٢) گوزەراندن، رابواردن ف ١) بەانجام رسانیدن؛ ٢) گذراندن.

**بردنەوە:** ١) قازانج لەقوماردا؛ ٢) گەڕاندنەوە بۆشوینی پێشو ف ١) بُرد در قمار؛ ٢) بازگرداندن.

**بڕدۆنە:** زەلامی ناقۆڵاو تەڕە ف بلندبالای تنومند.

**بڕە:** شفرە، ددانی بەراز ف شُفرهٔ گُراز.

**بڕەك:** نێرەبەراز، یەکانە ف گراز.

**برزە:** گوم، ون، وندا ف گُم، مفقود.

**برژ:** بەئاگر چزان بێ سوتان: (گۆشتە کەهێشتا نیوەبرژ بۆخواردمان) ف برشت.

**برژان:** ١) برشتەبون؛ ٢) مژۆل، بژانگ، موی پێلوی چاو، برژانگ ف ١) برشته شدن؛ ٢) مُژه.

**برژاندن:** براشتن، بریان کردن، بۆدان ف برشته کردن، بودادن.

**برژاندنەوە:** خوێن ڕاگرتنی برین بەدەرمان ف خون بست کردن زخم به کمك دارو.

**برژانگ:** بژۆل، مژۆل، موی پێلوی چاو ف مُژه.

**برژانەوە:** ١) سوزیانەوەی زام، ژانی برین و سوتان؛ ٢) وێستانی خوێن بەهۆی دەرمان ف ١) سوزش زخم؛ ٢) خون بندآوردن با دارو.

**برژاو:** ١) براشتی، بریان؛ ٢) برژانگ ف ١) برشته؛ ٢) مُژه.

**برژۆل:** ١) برژانگ؛ ٢) برزەوریشاڵی کۆتاڵ؛ ٣) داسوکەی گوڵی دەغل ف ١) مژه؛ ٢) پرز قماش؛ ٣) پُرز خوشه گندم و...

**برژی:** برژاو ف برشته.

**برژیاگ:** برژاو ف برشته.

**برژیان:** برژان ف برشته شدن.

**برژیانەوە:** برژانەوە ف نگا: برژانەوە.

**برژیاو:** برژاو ف برشته.

**برژین:** برژان ف برشتن.

**برژینەوە:** برژانەوە ف نگا: برژانەوە.

**برژیو:** براشتی، برژاو ف برشته.

**برساق:** جۆرێ شیرینی ف نوعی قطاب.

**برس:** وزە، هێزو توانا ف توان، نا.

**برست:** بڕس ف توان.

**برسی:** برچی، نیز، دژی تێر ف گُرسنه.

**برسیایەتی:** بێ نانی، ورگ بەتاڵی ف گُرسنگی.

**برسێتی:** برچینی، برسیاتی ف گُرسنگی.

**برسیەتی:** برسیایەتی، ئاوراییی ف گُرسنگی.

**برش:** ١) کەڕو، ئەوکـەفـە شینـەی دەکـەوێتـە سەر ترشاوو نانی کۆن، کەڕەکیفە؛ ٢) ناحـەزو ناشیرین: (رەش و برشە)؛ ٣) هەنـاسەو هێز: (یەك چەند گەرمە، برشم هەلات) ف ١) کَفَك؛ ٢) سیەچردە؛ ٣) نفس و رَمَق.

**برشت:** ١) هێزی بڕین؛ ٢) بەهـرەی چێنـدراو؛ ٣) زەمینی بەپیت؛ ٤) برس؛ ٥) پارچـەیەکی بڕاو بۆ درون؛ ٦) کۆز، قاش: (برشتێ هەنی داپێم) ف ١) بُرش؛ ٢) بهرهٔ محصول؛ ٣) زمین حاصلخیز؛ ٤) تاب و توان؛ ٥) پارچهٔ برش خورده آمادهٔ دوخت؛ ٦) قاچ هندوانه و...

**برشتە:** برژاو ف برشته.

**برشتی:** برژاو ف برشته.

**برغو:** بزماری بەپێچ، ئامرازی کون کردنی پێچدار ف میخ‌پیچ.

**برغی:** برغو ف میخ‌پیچ.

**بڕفێن بڕفێن:** رفاندن بێ‌پرسی خاوەن ف چپاول و غارت.

**برقۆك:** بەتروسکە، بریقەدار ف برّاق.

**برقە:** درەوشین، بریقە، تروسکە ف درخشش.

**برقەندەرە:** تۆڕك، تۆڕی، چەقەڵ ف شغال.

**برك:** ١) خاڵیگە، کەلەکە؛ ٢) دەردوژانی خاڵیگە؛ ٣) حەوز، ئەستێڵ؛ ٤) هاویشتن: («بـرکی دە»: بیهـاوێژە، فڕێی‌دە) ف ١) تُهیگـاه؛ ٢) درد تُهیگاه؛ ٣) استخر؛ ٤) انداختن.

**بڕك:** ١) هێڵنج، دڵ تێك‌چون‌و خەریك ڕشانەوەبون؛ ٢) پنجی بێستان: (بڕکە شوتی)؛ ٣) ئەستێڵ، ئەستێر ف ١) حالت تهوّع؛ ٢) بوته؛ ٣) استخر.

**بڕکە:** ١) پنجی بێستان: (**بڕکە کاڵەك**)؛ ٢) کەرك، کەرت لە مەڕو ئاژەل؛ ٣) گیایەکی بۆنخۆشی کوێستانە؛ ٤) پارچەی تێری جلك، قەوارە ف ١) بوته پالیزی؛ ٢) دسته‌ای از گله؛ ٣) گیاهی خوشبو؛ ٤) قوارهٔ پارچه.

**بڕگە:** ١) جێگەی شکاندنی جۆ بۆ ئاودێری؛ ٢) شوێنی لەلەکراو لە دار یا لەئـاسن ف ١) جای بریده از جوی برای آبیاری؛ ٢) شیار زدن روی چوب یا آهن.

**بڕگەبڕگە:** زۆر لەلەکراو ف بریدگی بسیار.

**برمـە:** ١) نوزەو ناڵـەی تادار؛ ٢) جۆرێ شیرینی‌یە گوێز یا پستەی تێ دەکرێ ف ١) آه و نالهٔ تب‌دار؛ ٢) نوعی شیرینی.

**بڕمـە:** پڕمـە، پرمە، دەنگ لەلوت هاتنی ئەسپ لە غلوریان؛ ٢) گوڕەو بۆڵەی پیاوی توڕە: (کاورا بەسیەتی ئەم **بڕمە بڕمەت** لەچەیە؟!) ف ١) صدای بینی اسپ؛ ٢) غُرولَند.

**برمـەبـرم:** قسـە لەناو دەمداکردن کە پیاوتێ نەگا، بۆڵەبۆڵ: (کاورا هەر **برمەبرمیەتی** نازانم دەرێ چی؟!) ف زیرلب حرف زدن، غرولند.

**بڕمێن:** بەکارو ئازاو بەبرشت ف آدم کارا و قاطع.

**برن:** بردن، دژی هاوردن ف بُردن.

**بڕناخ:** کونەکەپو، کونی‌لوت، کونادفن ف سوراخِ بینی.

**بڕناخە:** بڕناخ ف سوراخ بینی.

**برنـج:** ١) دانـەوێڵەیەکی سپی‌و بژیوە، روتـەوەبوێ چەڵتوکە، لە مەرەزە بەرهەم دێت؛ ٢) کانزایەکە تێکەڵاوی مس‌و رۆح ف ١) برنج؛ ٢) آلیاژ برنج از ٦٠٪ مس و ٤٠٪ روی.

**برنجاڕ:** مەرەزە، کێڵگەی برنج ف شالیزار.

**بڕنجاڕ:** پەرێز، جێگەی درەوکراوی خەلە، جاڕ ف جای غلهٔ درو شده.

**برنجکـوت:** ١) دینـگ، دەسکو سندۆڵ؛ ٢) دینگچی: کەسێ چەڵتوك نەکوتێ ف ١) دنگ؛ ٢) دنگ‌کوب.

**برنجۆك:** ١) مو، نەخوشیەکی زۆر بەژانە لە پەنجە دێت؛ ٢) پارچەیەکی تۆڕی ناسك ژنان دەیکەنە دەسماڵی سەر ف ١) کژدُمه؛ ٢) پارچهٔ وال.

**برنجە:** کانزای مس‌و رۆح، زەردی سەماوەر ف آلیاژ برنج.

**برنجەجاڕ:** مەزرای مەرەزە، برنجاڕ ف شالیزار.

**برنجی:** ١) وەك برنج: (ئەو ددانە **برنجیەت** چەند جوانە)؛ ٢) هەرەباش ف ١) بەرنگ برنج؛ ٢) هرچیز بسیار خوب.

**بڕندە:** بڕرا: (ددانی بڕەك **بڕندەیە**) ف بُرّا.

**برنگ:** ١) قەیچی مەڕبڕینەوە، هەورینگ، مقەستی گەورە بۆ هەڵپاچینی کوڵکەی ئاژاڵ؛ ٢) تۆرهەڵدان؛ ٣) زۆر وشك: (وشك‌و **برینگ**) ف ١) دوکارد؛ ٢) پَرت؛ ٣) بسیار خُشك.

**برنگە:** مقەستی حەیوان بڕینەوە ف دوکارد.

**برنگەوان:** لەمەڕ بڕینەوە وەستاو شارەزا ف استاد در پشم‌چینی گوسفند.

**بڕنەو:** جۆرێ تفەنگ کە کاری شارێکە بەوناوە ف نوعی تفنگ.

**برنوتی:** سعوتی، تۆزێکە بەکەپۆ ئەکێشری لەباتی توتن کێشان ف اَنفیه.

**بڕنە:** وشەی فەرمانە واتا: بەدەس هەڵقەنەیان بچنە ف امر به چیدن.

**برنەڤە:** ١) وەگەڕاندن؛ ٢) لەقومارا قازانج کردن ف ١) بازگرداندن؛ ٢) در بازی برنده شدن.

**برنەوە:** برنەڤە ف نگا: برنەڤە.

**بڕۆ:** ١) فەرمانە بۆ ڕویشتن؛ ٢) لەپاش تالان دەگوتری بەواتا راماڵین‌و هیچ نەهێشتن: (تالاڵن‌و **بڕۆیە**کە مەپرسە!) ف ١) *فعل امر*: برو؛ ٢) چپاول.

**برۆ:** ئەبرۆ ف اَبرو.

**بڕوا:** ١) ئیجازە، ڕەوا زانین: (دڵم **بڕوا** نادات چاوم بەمناڵی بکەوێ)؛ ٢) باوەڕ، ئیمان ف ١) اجازه؛ ٢) باور.

**بڕوانامە:** باوەرنامە ف اعتبارنامه، کارنامهٔ تحصیلی.

**بڕوایی:** ١) باوڕی؛ ٢) رەوازانین ف ١) عقیده؛ ٢) روادیدن.

**بروز:** ئاشکرا ف آشکار.

**بڕوسك:** کەموکە، تۆزکاڵ: (هەر **بڕوسکێکم** دەیە بەسمە) ف بسیار کم، اندك.

**بروسك:** ١) جەخماخەی هەور؛ ٢) تەزوی بەژان: (**بروسکێك** دەبشتم وەستا)؛ ٣) بریقە: (لەدورەوە **دەبروسکێ**) ف ١) برق ناشی از ابر؛ ٢) تیرکشیدن جسم؛ ٣) درخشش.

**بروسکان:** بریقەدان ف درخشیدن.

**بروسکانەوە:** بریقانەوە، درەوشانەوە ف درخشش.

**بروسکـە:** ١) بروسـك؛ ٢) تێلگراف، بەرقییە، بورقی، تەلغراف ف ١) نگا: بروسك؛ ٢) تلگراف.

**بروسکیان:** بروسکان ف درخشیدن.

**بروسکین:** بروسکان ف درخشیدن.

**بڕوش:** وردەی ساوار ف ریزهٔ بلغُور.

**بڕۆش:** مەنجەل، دیزەی لەمس ف دیگ مسی.

**بڕوشە:** دانەدانە بارینی بەفری تەنك‌و پانکەڵە ف بارشِ برف به آرامی.

**بروقە:** بریقە ف درخشش.

**بڕوکە:** کەموسکە، زۆرکەم ف خیلی اندك.

**بروێسی:** برسکەی عاسمان ف برق آسمان.

**بڕوێش:** ١) دەنکی دەغڵی پەڕش؛ ٢) وردەی ساوار ف ١) دانهٔ بلغور؛

٢) ریزهٔ بلغور.
**بڕویٚشین:** چیٚشتی بڕویٚش ف آش بلغُور.
**بڕه:** ئەبرۆ ف ابرو.
**بڕه:** ١) ددانـه دیارەکەی یەکانه، شفره، کەڵبی نێره بەراز؛ ٢) نێره بەراز، یەکانه؛ ٣) چنینی گەنمەشامی؛ ۴) بەیاری نێوان دوکێڵگە؛ ۵) گوتره، بیٚ‌ژمـارو پیٚوان؛ ۶) خاکـەی مشـار؛ ٧) مشار، هەڕه؛ ٨) بریەتیه له فرزەنـدی میٚوینـه؛ ٩) بریەتی له پیاوی زۆر بەکارو هەڵکەوته؛ ١٠) خاکەی بڕبەند؛ ١١) تەواو سوربونەوەی سواڵەت‌و توندبونی هیٚلکەی کولاو؛ ١٢) ببڕه؛ ١٣) مەخته، قونتەراتی ف ١) دندان پیدای گراز؛ ٢) گُراز؛ ٣) چیدنِ ذرّت؛ ۴) فاصلهٔ میان دو زمین شخم شده؛ ۵) گوتره، سرهم بی‌شمارش؛ ۶) خاك ارّه؛ ٧) ارّه؛ ٨) فرزند مؤنث؛ ٩) مرد کارا و شُجاع؛ ١٠) ریزهٔ سوهان؛ ١١) خوب پختن آجر و زیاد آب‌پز شدنِ تخم‌مرغ؛ ١٢) قطع‌کُن؛ ١٣) کنتراتی.
**برەش:** هەژارو بیٚچاره ف بی‌نوا.
**برەڤان:** نێوبژی‌کار، نیوانجی کەر ف میانجی.
**بڕەك:** ١) نێره بەراز؛ ٢) مشار، هەڕەی دوکەس، شەقه مشار ف ١) گراز نر؛ ٢) ارّه.
**برەو:** ڕەواج، ڕەونەق ف رواج.
**بری:** ١) خۆزگه، خۆزی، کاشکا؛ ٢) بات، جیات ف ١) کاش؛ ٢) بجای.
**بریٚ:** برا ف برادر.
**بڕی:** قرپ، قورپ، نرکـەی گەرو که زۆرتـر دوای زۆرخـواردن دیٚت، قورقینه ف آروغ.
**بڕیٚ:** ١) کەمیٚك؛ ٢) پارچـەداریٚکی بڕاو ف ١) انـدکی، کمی؛ ٢) تنـهٔ درختِ قطع شده.
**بریا:** خۆزی، کاشکا ف کاشکی.
**بڕیا:** بردرا، نەما، بڕا ف نگا: بڕا.
**بڕیار:** پەیمان، شەرت، قەرار ف شرط و قرار.
**بڕیاش:** ئەی‌بڕی، ئەی‌وڕی ف می‌بُرید.
**بڕیان:** ١) بڕین، لەت‌بون؛ ٢) دورکەوتن ف ١) بریده شُدن؛ ٢) دورافتادن.
**بریان:** گۆشتی براشتی ف گوشت برشته.
**بڕیانەوه:** بڕوانه بۆ بڕ ف نگا: بڕ.
**بریانی:** بەرخی بەگیپه له تەندوردا ف گوشت برّهٔ در تنور تف‌داده.
**بریٚتی:** ١) هیمـای بەواتـا: کینـایه؛ ٢) پوختەی، دەکاته: (چواروچوار بریٚتی‌یه لەهەشت)؛ ٢) باتی، جیاتی ف ١) کنایه؛ ٢) عبارت است از؛ ٣) بجای.
**بریٚژ:** پاشگری بەواتا برژیٚن: (تە گۆشت بریٚژبه) ف بریان کُننده.
**بڕیٚژ:** قاڵبی داڕشتن ف قالب ریخته‌گری.
**بریٚژیان:** برژاندن ف برشتن.
**بریس:** تروسك ف درخشش.
**بڕیٚس بڕیٚس:** چەقەو هەراو قوڵەقوڵ، زەنازەنا ف جاروجنجال.
**بریسك:** ١) تەزوی بەژان؛ ٢) ئاورینگ ف ١) تیرکشیدن بدن؛ ٢) شرار.
**بریسکان:** درەوشین ف درخشیدن.
**بریسکه:** بروسکه ف برق آسمان.
**بریسکەبریسك:** بریقەبریق ف درخشش پیاپی.
**بریسکەدانەوه:** بریقەدانەوه ف درخشش.
**بریسکینەوه:** بریقەدان ف درخشیدن.
**بڕیٚش:** بڕویٚش ف نگا: بڕویٚش.
**بڕیٚشت:** بڕینی پارچەی جلك ف بُرش پارچهٔ لباس.
**بریشته:** برشته ف برشته.
**بڕیٚشکه:** دانەویٚڵەی لەسەرساج بۆدراو ف حبوب بوداده.
**بڕیٚشگه:** بڕیٚشکه ف حبوب بوداده.
**بریڤ:** پەلەو عەجەله ف عجله و شتاب.
**بریق:** ١) ئافتاوه، بریك؛ ٢) تروسکه: (لەدورەوه **بریقەبریقی** دەهات) ف ١) آفتابه؛ ٢) درخشش.
**بریقان:** تروسکان، بروسکان ف درخشیدن.
**بریقانەوه:** درەوشان، بروسکان ف درخشیدن.
**بریقه:** درەوشین ف درخشش.
**بریقەبریق:** تروسکەی بەشویٚن یەکا ف درخششِ پیاپی.
**بریقەدانەوه:** کەوانەی تروسکه له شوشه یان ئاو ف انعکاس پرتو.
**بریك:** ئافتاوه، **لوولیٚنه** ف آفتابه.
**بریکا:** خۆزی، بریا، خۆزیا ف کاشکی.
**بریکار:** وەکیٚل، نایب ف وکیل.
**بریکه:** بریقه ف درخشش.
**بریکەنیٚ:** کاشکا، خۆزی ف کاشکی.
**بڕین:** بڕوانه بۆ بڕ ف نگا: بڕ.
**برین:** زام، کوان‌و شویٚنی تیخ لەلەشدا ف زخم.
**بڕیٚن:** ١) مقـەستی خوری هەڵپـاچین؛ ٢) گیایەکی شیرەداره ف ١) دوکارد؛ ٢) از گیاهان داروئی.
**برین‌پیٚچ:** هاریکاری بژیشك ف پزشکیار.
**بریندار:** زامار ف زخمی.
**برینگ:** ١) مقەستی خوری هەڵپاچین؛ ٢) بیٚ‌تەڕایی ف ١) دوکارد؛ ٢) تمام خُشك.
**بڕینگه:** مقەستی خوری هەڵپاچین ف دوکارد.
**بڕینه:** برینگی خوری هەڵپاچین ف دوکارد پشم‌چینی.
**بڕینـەوه:** ١) لەت‌کردن بەتیخ‌و مشارو...؛ ٢) کوڵکه هەڵپاچینی ئاژەڵ؛ ٣) لەشیر گرتنـەوەی بیٚچـو؛ ۴) هەنگـوین له خەلیٚف کردنـەوه؛ ۵) لەقسه بەس کردن ف ١) بوسیلهٔ تیغ و ارّه و... بریدن و قطع کردن؛ ٢) چیدن پشم؛ ٣) از شیر گرفتن بچـه؛ ۴) گرفتنِ عسـل از کنـدو؛ ۵) خاموش شدن و سخن بس کردن.
**بریو:** پەله، لەز ف شتاب و عَجله.
**بڕیٚو:** ئەوڕگیٚ، ئەپچڕیٚ ف پاره می‌شود.
**بریەتی:** بریٚتی ف نگا: بریٚتی.

**بڕیەی:** بڕین ف پارە کردن.

**بز:** ۱) منالّدان؛ ۲) زەق، زاق: (چاوبز)؛ ۳) بزن؛ ۴) ناوکی ئاسکی میسك؛ ۵) جوز، سوك، قامك بۆقون بردن؛ ۶) جەغز، جوغز، خەتی کەمە لە زەوی؛ ۷) پیو، چەوری ناوزگ، بەز ف ۱) زهدان؛ ۲) برجسته؛ ۳) بُز؛ ۴) ناف آهوی مُشك؛ ۵) انگولك؛ ۶) دایره؛ ۷) پیه.

**بزاف:** جوڵە، حەرەکەت ف حرکت.

**بزان:** زۆرزان، دانا ف دانا.

**بزاو:** بزاف ف حرکت.

**بزاوتن:** جوڵاندن، بزواندن ف جنبانیدن.

**بزبزۆك:** گوڵێکە لەنەورۆزدا دەپشکوێ ف گلی بهاری.

**بزبێزی:** گیایەکە گوڵی سپیواش دەکا ف گیاهی است.

**بزپێوە کردن:** قامك بۆقنگ بردن ف انگولك.

**بزدان:** ۱) پسان، قەتیان؛ ۲) ترسان ف ۱) گسستن؛ ۲) ترسیدن.

**بزداندن:** ۱) پساندن؛ ۲) ترساندن ف ۱) بگسلاندن؛ ۲) ترساندن.

**بزدم:** رویشتن بەسەری پەنجە ف پاورچین.

**بزدنۆك:** ترسێنەر ف ترساننده.

**بزدونەك:** ترسۆنەك، ترسەنۆك، قزە ف ترسو.

**بزدهان:** ترسان ف ترسیدن.

**بزدیان:** بزدهان ف ترسیدن.

**بزدیای:** ترسیاو، ترساو ف ترسیده.

**بزدینۆك:** بقە، خەتەر ف خطر.

**بزر:** ۱) ون، گوم، بەرزە، وندا؛ ۲) رۆن کەتان ف ۱) گُم؛ ۲) بَزرَك.

**بزڕ:** ۱) بەگلو داوەستـان وەك رۆن دوگ؛ ۲) بزگوڕ، تیتـوڵ ف ۱) لخته بستن و فاسدشدن لبنیات؛ ۲) تکەپارچهٔ کهنه.

**بزڕاندن:** دڕاندن، چڕاندن، دادڕینی کوتاڵ ف پاره کردن قُماش.

**بزڕکـان:** ۱) تێكچونی شیر و ماست، هەڵگەڕانی شیر و ماست و دۆ؛ ۲) رەنگ پەڕین لەترسان یان لەڕکان؛ ۳) تروکانی چاو ف ۱) فاسدشدن شیر و ماست؛ ۲) رنگ باختن؛ ۳) چشم برهم زدن.

**بزڕکاندن:** ۱) هەڵگەڕاندنی شیر و...؛ ۲) رەنگ پەڕاندن؛ ۳) تروکاندنی چاو؛ ۴) راوانـدن، قسـەپەڕاندن: (ترساوە قسان دەبزڕکێنێ) ف ۱) فاسد کردن لبنیات؛ ۲) ترساندن و رنگ باختن؛ ۳) چشم بر هم زدن ۴) هَزیان گفتن.

**بزرۆك:** زیپکەی زۆر وردف جوش ریز پوست.

**بزگ:** ۱) موروی شیلانی گەردانە؛ ۲) پزو، پزگ، جێگەی دۆخین ف ۱) مهرهٔ قرمز زینتی؛ ۲) نیفە.

**بزگـوڕ:** پارچـەیەکی باریك لەقـومـاشی کۆن و رزیو ف نوار باریك از قماش کُهنه.

**بزگیر:** رژدو دەست قوچاو، چکوس، سەقیل ف خسیس.

**بزگیلە:** گیایەکی بالابـەرزە گوڵی ئاماڵ سورە بەرەکەشی وەك گێلاس وایەو ئاماڵ سورە ف گیاه کاکنج.

**بزگێلە:** بەربوك ف ینگە.

**بزلماجی:** جۆرێ کولێرەی ساجی ف نوعی گرده نان.

**بزلە:** کاریلە، بەچکەبزن ف بُزغالە.

**بزماتە:** قرتماغەی سەری برین ف خشك ریشهٔ زخم.

**بزمار:** مێخ ف میخ.

**بزمار ریژ:** بەبزمار قایم کراو ف میخکوب.

**بزمارکوت:** ۱) بزمارریژ؛ ۲) جۆرێ هێشوە ترێی پڕ و تێك پەستواو ف ۱) میخکوب؛ ۲) نوعی خوشهٔ انگور.

**بزمارۆك:** مێخەکە ف میخچە.

**بزمـــارە:** ۱) بزمـاری دارین کە کون و کەلێنی دۆلاشی پێ دەگرن؛ ۲) مێخەکە ف ۱) میخ چوبین ناوبندِ آسیا؛ ۲) میخچە.

**بزمك:** دمبێنی بێجوی ئاژاڵ تا نەتوانێ شیر بمژێ، زاربێن، بزمۆك ف پوزەبَند.

**بزمۆك:** بزمك ف پوزەبَند.

**بزمەتە:** قرتماغەی برین ف خُشك ریشهٔ زخم.

**بزمەك:** بزمك ف پوزەبند.

**بزن:** ئاژەڵی بەشاخ و ڕیشی دایکی گیسك و کار ف بُز.

**بزنانە:** پیتاکی سەرانەی بزن بۆ میری ف باج و سرانهٔ بز.

**بزنترێنە:** گیایەکە لە کەوەر ئەکاو سەلکی هەیە ف گیاهی است.

**بزنلەر:** باڵـدارێکـە بۆر بەقـەد قازەو گۆشتی ئەخورێ ف پرندەایست بزرگ و بەرنگ خاکستری و حلال گوشت.

**بزنمژ:** جۆرە مارمێلکەیەکی درێژو ستورە، تیرتیرە، تێرتێرە ف بزمجە.

**بزنمژە:** بزنمژ ف بزمجە.

**بزنمشك:** بزنمژ ف بزمجە.

**بزنـەدۆخـە:** بزنێ کە دەدرێ بەئـاغا دۆی بخوا ف بزی کە بهرەاش را ارباب می برد.

**بزنەڕیشە:** گیایەکە لەشویت ئەکاو سەلکی هەیە ف گیاهی است.

**بزنەکێفی:** بزنەکێوی، کۆوی ف بُز کوهی.

**بزنەکێوی:** بزنەکێفی ف بُز کوهی.

**بزنەوەس:** مەشکەی بزن ف مشك از پوست بُز.

**بزنیری:** گیایەکە بۆلەوڕ دەبێ ف گیاهی است.

**بزو:** ۱) جۆرێ داربی؛ ۲) سەرەتای کلکی یەکسم لەلای قونیەوە ف ۱) نوعی درخت بید؛ ۲) زیر دُم ستور.

**بزواندن:** جولاندن، تلپێدان ف تکان دادن.

**بزۆت:** بسۆت، سەرەبزوت، چیلکەو داری سەربەئاگر ف نیمسوز.

**بزۆتك:** بزۆت ف نیمسوز.

**بزوتن:** جولان ف جُنبش.

**بزۆز:** بێ ئۆقرە، هەرلەگەڕاندا ف بی‌آرام و همیشه در حرکت.

**بزۆق:** ۱) هەڵبـــەزدابـــەز؛ ۲) تەنبـــور: ئامـرازێکی موسیقیەف ۱) وَرجَهیدن؛ ۲) طنبور.

**بزوك:** زیرەك و پڕجوڵە ف زرنگ و همیشه در حرکت.

**بزۆك:** ۱) جوڵێنـــە، جولێن، وەحـەرەکـەت خەر؛ ۲) زۆر بەزگ و زا؛ ۳) زگ‌کەر، دژی نەزۆك ف ۱) مُحرِّك؛ ۲) بسیار زاینده؛ ۳) مقابل نازا.

**بزە:** ۱) زەردە خەنە؛ ۲) بزن؛ ۳) زەق تواشاکردن: (بزەی لێم کرد ترسیام)

ف ١) لبخند؛ ٢) بُز؛ ٣) نگاه خيره.

**بزەباقە:** بەلەباقە، نەخۆشيەكی بزنە، باقەبزن ف نوعی بيماری بُز.

**بزەبز:** زەق تێوەڕامان ف خيرەخيره.

**بزەڵە:** كوُدەڵەبەراز، بەچكە بەراز ف بچهٔ خوك.

**بزی:** بەزەیی: (بزی كا ناكا هورموز وەهويچ كەس) ف رحم و شَفَقَتْ.

**بزێ:** بەركەڵ، دامنەچەقان، نوهگوان، چێڵی سێ‌بەهار ديتی ف مادە گاو سەساله.

**بزيسك:** پريشكەی ئاگر ف شراره.

**بزێن:** گەمەی جغزێن ف نوعی بازی.

**بزێو:** ١) بزوز؛ ٢) پاشگری بزوێنەر: (كوردێ كە سەرهەڵێنی دەڵێن بوتە سەربزێو) «سەيف» ف ١) بی‌آرام و در حركت؛ ٢) مُحرّك.

**بژ:** ١) جگە، غەيرەز، بل؛ ٢) ياڵ، توكی ملی يەكسم‌و شێر؛ ٣) كاكوڵ؛ ٤) موی راست وەستاو لەترسا يا لەسەيران، گرژ، كرژ: (لەترسان هەمو موی سەرم بژ ويستان)؛ ٥) پارچە، پاژ، لەتك ف ١) جز؛ ٢) يال؛ ٣) كاكل؛ ٤) سيخ شدنِ موی از ترس يا تعجب؛ ٥) جُزء.

**بژار:** ١) گيای خراب لەناو زەرعات؛ ٢) دانەی بێگانە لەناو دانەوێڵەدا؛ ٣) خۆدوزين؛ ٤) ژمـار: (گوێزت بەبـژار دەدەمێ) ف ١) وجين؛ ٢) تنقيح؛ ٣) خودجُستن؛ ٤) شُماره.

**بژارتن:** ١) پاك كردنی دانـەوێڵە لە زيوان‌و شتی ناباب؛ ٢) ژماردن؛ ٣) برژاندن ف ١) پاك كردن غلات؛ ٢) شُمُردن؛ ٣) برشتن.

**بژارچن:** ئاسنۆ كێكی كلك‌داری دەم‌پانە كە گيای بژاری پێ هەڵدەكەنن، گياكەن ف بيلكِ وَجين.

**بژاردن:** ١) ژمـاردن؛ ٢) نەقـانـدن، چاك لەخـراب جياكـردنـەوە؛ ٣) تاوان‌دان ف ١) شمردن؛ ٢) برگُزيدن؛ ٣) تاوان دادن.

**بژاردە:** ١) كەم‌وێنە؛ ٢) ژمێردراو ف ١) كم‌نظير؛ ٢) شُمرده شده.

**بژاركردن:** ١) گيای بێ كەڵك فرێدان؛ ٢) خۆ دۆزين ف ١) وجين كردن؛ ٢) خودجُستن.

**بژاركەر:** كەسێ بژاردەكا ف وجينكار.

**بژارنـەوە:** ١) خەون گێڕانـەوە؛ ٢) دوبارە هەژماردن ف ١) بازگو كردن خواب؛ ٢) بازشمردن.

**بژارە:** ١) بژار؛ ٢) تاوان؛ ٣) تەرجەمە، وەرگێڕان؛ ٤) بژاردە؛ ٥) راستەو پاستـەكـردنی رايەڵ كە جوڵا ئەيكـا؛ ٦) خەيالاتی خەوزڕاو؛ ٧) خەولێكـدانـەوە ف ١) وجين؛ ٢) تاوان؛ ٣) ترجمـه؛ ٤) ممتـاز؛ ٥) تارەكشيدن؛ ٦) خيالات خواب پريده؛ ٧) تعبير خواب.

**بژاڵ:** ١) هەلاش، چرپی‌و پوشێ كەبـەسـەر ميچی‌دا ئەدەن؛ ٢) گيای بژار؛ ٣) بڵاوی‌و پەرێشانی ف ١) خلاشه؛ ٢) گياه هرزه؛ ٣) تشويش.

**بژانگ:** ١) مژۆڵ، برژانگ؛ ٢) پرزەو ريشاڵی كوتاڵ ف ١) مژه؛ ٢) پُرز قماش.

**بژانن:** ١) هەڵبژاردن، نەقاندن؛ ٢) برژاندن ف ١) انتخاب كردن؛ ٢) برشتن.

**بژبژ:** پاژپاژ، پارچەپارچە ف قطعه‌قطعه.

**بژبژە:** هەڵەپەزە، پەسپەسەكوڵە ف رُطيل.

**بژكين:** بڵاوبون، پڕژان ف پراكندن.

**بژل:** بەجگە، بەغەيرەز، بل ف بجُز.

**بژلی:** بژل ف بجز.

**بژن:** قژن ف ژوليده‌مو.

**بژنگ:** پريشكەی ئاو يا ئاگر، پريشك ف پَشنگ.

**بژنياگ:** بژاردە، هەڵبژاردە، نەقاندی ف انتخاب شده.

**بژنين:** ١) چنينەوە، هەڵگرتنەوە؛ ٢) خۆدۆزين، خۆپشكنين بۆ زيندو؛ ٣) دانەوێڵە بژارتن ف ١) برگرفتن؛ ٢) خودجُستن؛ ٣) پاك كردن غلّه.

**بژۆك:** ئيشتيا، ئارەزو، واز ف اشتها.

**بژۆل:** بژانگ، برژانگ ف مُژه.

**بژۆلك:** بژانگ ف مُژه.

**بژون:** ١) پاك‌و خاوێن؛ ٢) هەردی پڕگياو لەوەڕ، زەمەند؛ ٣) شوژن ف ١) پاك و تميز؛ ٢) زمينِ پر گياه و علف؛ ٣) جوالدوز.

**بژونی:** پاك‌و خاوينی لەش ف پاكيزگی بدن.

**بژوێن:** زەمەند، زەوی پڕگياو لەوەڕ ف زمين پرگياه و علف.

**بژەن:** كليل‌و گوڵە، كەلون، كێلون ف كليد و قفل چوبی.

**بژی:** ١) كاكوڵی سەر هەنيە، گودلە، فڕ؛ ٢) وشەی ڕێز: نەمری؛ ٣) ياڵ ف ١) زُلف؛ ٢) زنده باد؛ ٣) يال.

**بژياگ:** هەڵبژاردە، بژاردە ف انتخاب شُده.

**بژيان:** پژان، بڵاوبون، پەرژبون، پڕژان ف پراكندن.

**بژيشك:** حەكيم؛ لوقمان ف پزشك.

**بژيك:** خۆژی، خۆژيو، كەسێ چاوی لە يارمەتی كەس نەبێ ف مُتّكی به خود.

**بژيو:** ١) مايەی ژيان، هەرچێ پياوی پێ‌دەژی؛ ٢) بژيك ف قوت، مايهٔ زندگی؛ ٢) مُتكی بەخود.

**بژيوی:** پێداويستی ژيان، ئاردو دانـەوێڵەو ئازوخـەی ماڵ: (بـژيويمان لەماڵدا نيه) ف وسايل زندگی.

**بس:** بۆست، بست، لەسـەری توتـە تا سەری قامكـەگەورە بەبـڵاوی، بنكس، بنگوس ف وجب.

**بسبسۆك:** گوڵە ستێرە، گوەستێرە ف كرم شبچراغ.

**بست:** ١) بس؛ ٢) بستە، ئاسنی نێوان تەوەرەو بەرداش ف ١) وجب؛ ٢) قُطب آسياب.

**بستك:** ١) بستەی ئاش؛ ٢) بستەی سەرتەندور ف ١) قُطب آسياب؛ ٢) سيخ آهنی كه بر بالای تنور گذارند.

**بستو:** ١) ملەی كێو؛ ٢) بستی ئاش، بستەی ئاسياو ف ١) گردنهٔ كوه؛ ٢) قُطب آسياب.

**بستوگە:** كوپەڵە، كوپەی چكۆلە ف بستوغه.

**بستـە:** ١) ئاسنی نێوان گەروی دوبـەرداش؛ ٢) ئاسنی سەرتـەنـورو ئاورگ؛ ٣) پستـــە، فستق؛ ٤) چەقـــەنـە بەدەست؛ ٥) گوێ‌نەدەر، بێ‌پەروا ف ١) قطب آسياب؛ ٢) سيخِ تنـور؛ ٣) پستـه؛ ٤) بشكن زدن؛ ٥) بی‌پروا.

**بستەباڵا:** باوەعەمرە، چڵەنۆك، باوەقۆرەت ف كوتوله.

**بستەلێدان:** چەقەنە لێدان، پل‌تەقانن، تەقەلە پتەهێنان ف بشکن زدن.
**بستیك:** زەنگەتەترێ، تیسك، هێشولکە لەهێشو ف تلسك.
**بســـك:** ١) موی سەرلاجـــانـگ، ئەگریجـە؛ ٢) پرزەی سەربـەرگی گەنمەشامی ف ١) زلف؛ ٢) کاکُل ذرّت.
**بسکوڕی:** شەق‌و تورت‌و بەکەیف، بۆ زەرعاتی بەخۆداهاتوی دەڵێن ف شاداب.
**بسکۆك:** ئەوبسکەی بەرەو رومەت هەڵدەگەڕێتەوە ف خَم گیسو.
**بسکۆل:** پژی گەنمە شامی ف کاکُل ذرّت.
**بسکۆڵە:** گیایەکە لە ئەگریجە ئەکا ف گیاهی است شبیه به زُلف.
**بسکە:** بزەی لێو و گەشی‌رو لەخۆشیان ف تَبَسُّم.
**بسکەی سمێڵ:** زەردە خەنەی پەنامەکی ف خندهٔ زیرلب.
**بسڵمان:** موسوڵمان ف مسلمان.
**بسمار:** مێخ، بزمار ف میخ.
**بسمــارە:** ١) مێخـەکـەی‌پا؛ ٢) مو کە لەدەست دێ‌و زۆر بەژانە ف ١) میخچهٔ پا؛ ٢) کژدُمه.
**بسو:** وشەی فەرمان: بساوە، ڕێ‌خە، پێدابماڵە ف بسای.
**بسۆت:** بزوت، چڵوسك ف نیم‌سوز.
**بسۆخ:** تەنبور، بزۆق ف طنبور.
**بسوڵدان:** ١) موسوڵدان، میزەڵدان، کیسەی میز لەدەروندا؛ ٢) بریەتی لەگون ف ١) مثانه؛ ٢) کنایه از خایه.
**بسوڵمان:** بسڵمان ف مسلمان.
**بسە:** بوێستە، وچان‌بدە: (**بسە** ئەز بێژمەتە) ف بایست.
**بسەرڤەکرن:** بەسەر کردنەوە، مشور لێ‌خواردن ف احوالپرسی و تَفَقُّد.
**بسەکنە:** ئارام‌بە، راوەستە، هێدی بە ف آرام بگیر.
**بسیرە:** بەرسیلە، قۆرە، هاڵە ف غوره.
**بسێن:** ١) کڕیار؛ ٢) داگیرکەر ف ١) خریدار؛ ٢) غاصب.
**بسێنە:** ١) وەرگرە، بستێنە؛ ٢) بکڕە ف ١) بگیر؛ ٢) بخر.
**بسێنەوە:** کەسێ کە بۆستران بێژ یان شیوەن گێڕ دەگێڕێتەوە ف هیأت کُر.
**بشافتن:** هەڵ پشاوتن، گوشین بەدەست لەناو ئاودا: (سماق **بشافتی** یە بۆشیوێ) ف اَفشردن.
**بشانۆ:** ١) بلەرێنێتەوە؛ ٢) باوێژێ ف ١) تکان بدهد؛ ٢) بندازد.
**بشکافتن:** هەڵ پشکوتن، هەڵوەشانی جێ‌تەقەڵ ف شکافتن.
**بشکانن:** گریان بەدەنگی نزم، بەنوزە گریان ف آرام گریستن.
**بشکۆژ:** ١) خونچە؛ ٢) دوگمە، قۆپچە ف ١) غنچه؛ ٢) دکمه.
**بشکۆش:** خونچە، بێچوە گوڵی نەپشکوتو ف غُنچه.
**بشکول:** پشکەڵ، کشپەڵ، کشپل، قشپل ف پشك حیوان.
**بشمێ:** بڕۆین، بچین ف برویم.
**بشۆ:** ١) بچۆ؛ ٢) بشۆرە ف ١) برو؛ ٢) بشوی.
**بشۆرە:** خەمی زۆرگران کە دیق بەپیاو دەکا ف غم جانگداز.
**بشون:** بڕۆم، بچم ف بروم.
**بشۆن:** بشۆرن ف بشویند.
**بشیامێ:** بچوایتین، برۆیشتباین ف می‌رفتیم.
**بشێونە:** مایەفیتنە، سەرەسۆدرە، کێشە هەڵایسین، ئاژاوەچی ف آشوبگر و فتنه‌انگیز.
**بشێوە:** قەومان، کێشەو هەراو ئاژاوە ف آشوب.
**بشێوی:** ئاژاوە، بشێوە ف آشوب.
**بشێوێنی:** ئاژاوە ف آشوب.
**بعۆك:** دەم‌وچاو ناحەزی پیاوترسێن ف بدریخت.
**بغور:** غللور، لەقەڵەوی با ڕە گوێ کەوتو ف مغرور.
**بغورد:** بخوُر، سوتەنی بۆن خۆش ف بخوُر.
**بغوردان:** ئەوەی بخوُری تێدا دەسوتێ ف بُخوردان.
**بغوز:** بخوز، گای خەفۆك ف گاوی که در وقت کار بخوابد.
**بغـە:** برینـدارکـردن، سەربڕین بەزمانی مناڵەساوا: (دەس لەچەقۆکە نەدەی **بغەت** دەکا) ف زخمی شدن به زبان بچگانه.
**بفرا:** هەرشتەی خاوی بۆنەدراو ف رشتهٔ خام.
**بفرۆش:** فرۆشیار ف فروشنده.
**بڤ:** ١) دەنگی ژەنگە سورە؛ ٢) وشەیەکە مناڵی پێ دەترسێنن، خەتەر ف ١) صدای زنبور؛ ٢) کلمهٔ تهدیدِ بچه.
**بڤـر:** ١) خۆپـەسـەنـد، خۆهەڵکێش؛ ٢) بیور، تەوری داربڕین ف ١) خودپسند؛ ٢) تَبَر.
**بڤز:** ١) بوُز، داری بوُز؛ ٢) کرێژە بەرد، قەوزەی بەرد ف ١) درخت پشه؛ ٢) گل سنگ.
**بڤزەیی:** بەڕەنگی کرێژەبەرد ف بەرنگِ گُل سنگ.
**بڤڤە:** بڤ، بڤە ف کلمهٔ تنبیه بچه.
**بڤکێ:** ژنی حیز، خۆفرۆش ف زنِ خودفروش.
**بڤە:** بڤ ف نگا: بڤ.
**بڤێ‌نەڤێ:** خوایی نەخوایی، بتەوێ نەتەوی ف خواه‌ناخواه.
**بقم:** دەرمانە سوری چاو، دەنکێکە سور بۆ دەرمانی چاو ف دانهٔ گیاهی است برای چشم درد.
**بکوژ:** ١) پیاوکوژ، کوشنندە، گوژەر؛ ٢) کوشتن: (دنیاکە بگربکوژە) ف ١) قاتل؛ ٢) کُشتن.
**بکـە:** ١) فەرمانی کردن؛ ٢) پکەی جگ، بەڕودا کەوتنی میچ، ئیوهی، پشتە ف ١) بکُن؛ ٢) دَمَرافتادنِ شتالنگ.
**بکەوە:** ١) وەکە، بیکەوە؛ ٢) خۆت بەزەوی دادە ف ١) بازکُن؛ ٢) خود را بەزمین افکن.
**بکیانە:** بنێرە ف بفرست.
**بکێڵ:** زەوی کێڵ، کەسێ بەجوت یان بەبێڵ زەوی وەردەگێڕێ ف شُخم‌زَن.
**بگار:** بوار، دەراوی پەڕینەوە لەئاو؛ ٢) ڕێباز ف ١) گُدار؛ ٢) رهگُذر.
**بگاردن:** ١) رابواردن؛ ٢) هەڵتاوان، ئەزم، هەزم؛ ٣) پێك‌هێنان، جێ‌بەجێ کردن ف ١) گزراندن؛ ٢) هضم؛ ٣) انجام دادن.
**بگارە:** رابردن، بوردن ف گُذر.
**بگارەدان:** ڕێگەپێدان، دەرفەت پێدان ف مَجال دادن.

**بگر:** ١) وەرگرە؛ ٢) گرتن: (**بگربکوژ**) ف ١) بگیر؛ ٢) دستگیر کردن.

**بگرد گ:** رابردو، لەمێژینە ف گذشتهٔ دور.

**بگردن:** ١) بەخشین، ماڵدان بەکەسێ؛ ٢) بوردن، چاوپۆشی کردن ف ١) بخشیدن؛ ٢) گذشت کردن.

**بگـرە:** ١) بگـر: (نانەکەم لێ **بگرە**، **بگرەو** بەردەیکی سەیرە)؛ ٢) وای دانێ: (**بگرە** نەچوم، چی ئەکەی؟) ف ١) بگیر؛ ٢) فرض کُن.

**بگرەبەردە:** گرتن و بەردان ف بگیر و ببند.

**بگرەو بەردە:** بگرەبەردە ف بگیر و ببند.

**بگنۆ:** بکەوێ، بکەفێ ف بیُفتد.

**بگە:** بگەیە، بڕەسە: (**بگە** تا نویژت نەچوە) ف *فعل امر*: بِرَس.

**بگێ:** ١) بیژە؛ ٢) گان بکە ف ١) بگو؛ ٢) جماع کُن.

**بگێڕ:** ١) هەڵسوڕێن، کارگێڕ، مودیر؛ ٢) نەمەدماڵ، ئەوی لوا دەبەستێوێ و لبادی لێ چێ دەکا ف ١) مدیر؛ ٢) نمدمال.

**بگیر:** ١) گرتن: (ڕەش بگیر)؛ ٢) وەرگر، ئەستێن: (حقوق **بگیر**) ف ١) دستگیر کردن؛ ٢) گیرنده.

**بگێم:** ١) بێژم، بڵێم، ببێم؛ ٢) گان بکەم ف ١) بگویم؛ ٢) جماع بکُنم.

**بگێمتە:** بەتۆ بێژم، بێژمە تە، پێت بڵێم ف بەتو بگویم.

**بگین:** بگەهینە، بگەیەنە: (نامێ **بگین** دەستێ ڕەشۆ) ف برسان.

**بل:** بەجگـە، بەغـەیرەز: (هـاتـە دەستێ مە درەقسێ و دگۆ **بل** ژمەلێ / دەست بکەس دی دسەمایا کومەلاتێ نادم) «جزیری» ف بجُز.

**بڵ:** نەرمی زیاد لەپێویست: (شـوتیە کە **بڵ** بوە بەکـار نەماوە) ف نرمی بیش از حد و نامطلوب.

**بلا:** بلان، با: (دەف ژێ بەردە **بلا** بچە) ف بگذار.

**بلاّ:** بلا ف بگذار.

**بلاتە:** بالاتە، سەرەتای هەرەتی میوە ف موسم رسیدن میوه.

**بلازین:** بەلازین، گەزیزە، گوڵێکی کورتەبالای خەتخەتی عابی و سپی یە کە لەسەرەتای نەوروز پەیدا دەبێ و زۆر تەمەن کورتە: (کولێ دێت ئەو قەبـایی ئاسمـانی / لەتیفا شەنگ و نازکوەک **بلازین**) «جزیری» ف گلی که در آغاز بهار روید.

**بلاکوتك:** باڵدارێکی دەنگ خۆشە ف پرنده‌ایست خوش‌صدا.

**بلاڵوك:** ئاڵو باڵو ف آلو بالو.

**بلامك:** بزمك ف نگا: بزمك.

**بلان:** بلا، بلاّ ف بگذار، باشد.

**بلانە:** بلانێ ف بگذار.

**بلانێ:** باوابێ، بلانێ وابێت ف بگذار.

**بلاو:** ١) شین گێڕ، مردو لاوێنـەوە؛ ٢) دانـەلغاو ف ١) نوحه‌خوان؛ ٢) دهانهٔ لگام.

**بڵاو:** ١) بەلاف، پرژ، پرش، پەرژ؛ ٢) گوشاد، فرەه : (بێژنگی کون **بڵاوم** ناوێ)؛ ٣) پێزانـراو: (خـەبـەر وا **بڵاو**بـوە کە ئازار هاتـوە) ف ١) پراکنده؛ ٢) گُشاد؛ ٣) شایع.

**بڵاوکردن:** بەلاف کرن ف پخش کردن.

**بڵاو کردنەوە:** پەرژکردن، پرژاندن ف مُنتشر کردن.

**بلاوە:** ١) ئاڵقـەی ژێر دانـەلغاو؛ ٢) گوندێکە ف ١) دهنهٔ لگام؛ ٢) نام دهی است.

**بڵاوە:** دژی خڕ بونەوە: (لەچی کو بونەوە دە **بڵاوەی** بکەن) ف متفرّق شُدن.

**بڵاوە لێکردن:** دورکە وتنەوەی ئاپۆرەی خەڵك لەشتێ کەبۆی کۆ بونەوە ف از دور چیزی متفرّق شدن.

**بلبـل:** ١) بولبـول، بولبول، چقیکی خۆش بێژ؛ ٢) زمان‌پاراو، زمان تەڕ، قسەزان ف ١) بُلبُل؛ ٢) زبان‌آور.

**بلبلیشك:** ماسوڵە، ماسولکە، جوڵا داوی لەسەر هەڵدەکا ف ماسولهٔ نسّاجی.

**بڵتە:** پڵتە، دەنگی ئاو کە ڕەقێکی تێ کەوێ ف صدای آب وقتی که سنگ در آن اندازند.

**بلج:** گوێژ، گێوژ، گڤویشك ف زالزالك.

**بلچ:** بلج ف زالزالك.

**بلّح:** ١) ڕەوشت ناشیرین، هەرزە، ئاکار ناپەسەند؛ ٢) هیچ‌نەزان: (دنیا بەهەشت **بلّحانە**) ف ١) هرزه؛ ٢) ابله.

**بلّحی:** ئاکاری بێ‌شەرمانەو ناپەسەند ف هرزگی.

**بلّخ:** ١) باری سەرزمان و لێو؛ ٢) تڵفی ئاوی کوڵاو: (ناوی سەماور **بلّخ** دەگرێ) ف ١) بار زبان؛ ٢) جرمِ آبِ جوشیده.

**بلسك:** بست ئاسیاو ف نگا: بست.

**بلّغ:** بلّخ ف نگا: بلّخ.

**بلق:** ١) پۆرگی ئاو: (**بلقی** سەراوە ـ کاکە ـ جیهان تێ بفکرە تۆ!)؛ ٢) دەنگی کوڵینی ئاو ف ١) حُباب آب؛ ٢) صدای غلیان آب.

**بلقاو:** زەل، زەلکاو، زۆنگ، باتلاخ ف باتلاق.

**بلقـەدەرە:** جانـەوەرێکی زەردی پانکـەڵـەیە لە هەڵە پەزەدەکا، جۆرێ کاکڵەمۆشان ف نوعی عنکبوتِ زرد.

**بللور:** جۆرێ شوشەی جوان و ئەستور ف بلور.

**بلمباس:** تەگە، نێری، سابرێن ف بُز نر، تکه.

**بلمەبلم:** برمەبرم ف غر ولند.

**بلوچە:** کەپولە، کۆجیلە ف ظرف چوبی کوچك.

**بلور:** ١) بللور؛ ٢) بلوێر، نای، بلور، ئامرازی مۆزیك ف ١) بلور؛ ٢) نی لبك.

**بلوربێژ:** بلوێرژەن، شمشاڵ ژەن ف نی‌نواز.

**بلورڤان:** بلوێرژەن ف نی‌نواز.

**بلوری:** مەرمەرشا، خامی زۆرسپی ف قماش سفید ساده.

**بلۆز:** تێکەڵ پێکەڵ ف درهم و برهم.

**بلۆسك:** بستەی ئاش، بستی ئاساو ف آهن قُطب آسیاب.

**بلۆسك:** بلۆسك ف آهن قطب آسیاب.

**بلۆق:** ١) پێ‌گەیشتـو، شەیتان پێ‌کەنیو، خۆناسیو: (کوڕەکە **بلۆق** بوە، کیژەکـە **بلۆق** بوەو خۆی ناسیوە)؛ ٢) پۆرگ: (هـەمـوگیانی بۆتـە **بلۆق**)؛ ٣) چاوزەق: (توشی کاورایەکی **بلۆق** هاتم لێی ترسیام) ف ١) بالغ؛ ٢) تاول؛ ٣) چشم برجسته.

**بلول:** بلور، نای، نەی ف نی لبك.
**بلول بێژ:** نەی‌ژەن ف نی‌نواز.
**بلوێر:** ١) بلول؛ ٢) جێ‌میزی منال لەبێشکەدا، لولك ف ١) نی لبك؛ ٢) مجرای شاش بچه در گهواره.
**بلوێر بەزێن:** ١) منالێ میزی لەبلوێرەوە سەردەکا؛ ٢) بریەتی لە مرۆی بزوزو دانەسەکناو ف ١) بچه‌ای که در گهواره بسیار شاشد؛ ٢) کنایه از شخص ناآرام.
**بلوێرژەن:** بلول‌بێژ ف نی‌نواز.
**بلوێرژەنین:** بلوێرلێدان ف نی نواختن.
**بلوێرلێدان:** نەی زەنین، بلوێر زەنین ف نی نواختن.
**بلوێل:** بلول ف نی‌لبك.
**بلوێن:** بلوێر ف نی‌لبك.
**بله:** ١) برۆ، بچو، بچە، هەرە؛ ٢) سوکەڵەی ناوی ابراهیم ف ١) برو؛ ٢) مُخَفَّفِ ابراهیم.
**بلەبـڵ:** ١) فڵتـەفڵت، قسەی‌وا کەسی تێ نەگا؛ ٢) دەنگی‌ورچ ف ١) سخن نامفهوم و بی‌معنی؛ ٢) صدای خرس.
**بلەت:** گۆیژ، بلچ، گویشك ف زالزالك.
**بلەتی:** بلەت ف زالزالك.
**بلەربەزێن:** هاروهاج، بێ‌ئارام ف کنایه از بزن‌بهادُر.
**بلەکناچێ:** ژنانیلە، ژنانی، کچانی، پیاو ئەدای ژن دەربێرێ ف مردِ زن‌نما.
**بلەماج:** پەڵوڵەی شل، چێشتی گزمولەئاردی تراو، پرپۆڵە ف آش خورده خمیر.
**بلەمو:** دمبێن، بزمك ف نگا: بزمك.
**بلەنگاز:** بەلەنگاز، هەژارو لانەواز، بێچارەو نەدار ف بی‌نوا، بیچاره.
**بلەور:** شوشەچرا ف شیشهٔ چراغ.
**بلەوەز:** لاسار، گوێ نەبیست ف سرسخت، حرف‌نشنو.
**بڵێ:** بێژە، بۆشە، واچە ف بگو.
**بلێت:** پسولە، پەتە، بیتاقە ف بلیت.
**بڵێزە:** گڕی ئاگر، گوڕی‌ئێگر ف لَهیب.
**بڵێسە:** بڵێزە ف لهیب.
**بلیکە:** میتکە، قیتکەی‌قوز، بەلۆکە ف چچوله.
**بلیمەت:** هەڵکەوتە، پیاوی کەم‌وێنە ف نابغه.
**بلیمەت:** بلیمەت ف نابغه.
**بلێنە:** کەین‌وبەین، لەدوی خلێنەی دەڵێن: (خلێنەو بلێنە یەکیان هەیە) ف رابطهٔ مخفی.
**بم:** ١) بێدەنگی، قروقپ؛ ٢) تەژەی ناقۆلا؛ ٣) ترسێنەر: (خۆی بم‌کردوە واتـا: دەیەوێ لێی بتـرسن) ف ١) سکـوت؛ ٢) شخص لنـدهور و بدقیافه؛ ٣) ترساننده.
**بمانێ:** فەنای بێدەنگ، قروقپی بەکۆمەڵ ف سکوت دسته‌جمعی.
**بمبسیك:** گیایەکی کوێستانی‌یە ف گیاهی کوهستانی است.
**بمومو:** مو بەمو، سەرلەبەر، پشکنینی تەواو: (تەفتیشی بمومو بکە گەر ئەم بخەتائین) «جزیری» ف مو بەمو، سراپا.
**بمە:** بەئێمە ف بەما.
**بمەش:** ١) برۆ، بچو، لوە؛ ٢) بەپیادەیی ف ١) برو؛ ٢) پیادەروی.
**بن:** ١) خوارەوە، ژێر؛ ٢) نەمام، دار: (**بنە** هەنار، دوبن سێو)؛ ٣) سەلك: (**بنە** چەوەندەر)؛ ٤) کچێنی، روسوری: (بوك **بنی** نەبوە)؛ ٥) بین: (ئێوە وەك بابنـان **بن**)؛ ٦) دوایی، ئاخـری: (سەرو**بنی** ئەوکارە کێ ئەیزانێ؟) ف ١) زیر؛ ٢) درخت، نهـال؛ ٣) بُنـه، ریشهٔ غُدّه‌ای؛ ٤) بَکارت؛ ٥) باشید؛ ٦) انتها، نهایت.
**بناخە:** بناغە ف شالوده و اساس.
**بنار:** ١) داوێنی کێو بەرەو دەشت؛ ٢) گەورەی ماڵ، سەرۆکی خێزان؛ ٣) دمەقاڵە: (وردە **بنارێك** بو) ف ١) دامنهٔ کوه؛ ٢) سرپرستِ خانواده؛ ٣) درگیری لفظی.
**بنـاشت:** ١) ئاخافتن، قسەکردن؛ ٢) دەمەقاڵە ف ١) گفتگوکردن؛ ٢) درگیری لفظی.
**بناغە:** بناخە ف شالوده و اساس.
**بناقاقە:** ناوەراستی گەرو لەدەرەوە، ریگەی هەناسە ف بیخ گلو.
**بناقە:** بناقاقە ف بیخ گلو.
**بن کوانیلە:** جۆرێ ئەستورك ف نوعی گرده.
**بناگوێ:** بنانگوێ، پەنای گوێچکە، پەناگوێ ف بناگوش.
**بنانگوێ:** بناگوێ، بەینی بنی‌کاکیلەو گوێچکە ف بناگوش.
**بنانگوێچکە:** بناگوێ ف بناگوش.
**بنـاو:** ١) دارێکی بێ‌بەرە؛ ٢) قوم لەئـاوا: (لـە مەلـەدا **بنـاو** دەبم)؛ ٣) ئەوشتـەی سەرئاو ناکەوێ ف ١) درختِ زبان گنجشك؛ ٢) غرقِ در آب؛ ٣) هرچه به زیر آب رود.
**بنـاوان:** ١) ئەوشوێنەی سەرەتای ئاو لەوێوە دێت، کانی‌یان ئەستێر؛ ٢) کەسێ کاری ناوماڵ بەرێوە دەبا ف ١) سرچشمهٔ آب؛ ٢) خانه‌دار.
**بناوان هەڵبەستن:** جۆگەسازکردن لە بناوانی ئاوڕا ف ساختنِ جوی در سرچشمهٔ آب.
**بناوبوێر:** دەغەزدار، لەدەروندا ناساز ف بیمارِ درونی.
**بناوەچ:** بناو ف درخت زبان گنجشك.
**بناوی:** داری بناو ف درختِ زبان گنجشك.
**بنباخەڵ:** ستوری باسك‌و زگ، بن‌هەنگڵ، بن‌کەوش ف زیر بغل.
**بنبار:** ١) چاوشۆڕو منەت‌بار؛ ٢) لباد یا هەڵدرواوێکی نەرم دەیخەنە سەر پشتی بارەبـەر لەژێر بارەوە ف ١) منّت‌کش؛ ٢) لبـاد یا هرچه که بر روی پشت ستوران اندازند.
**بنباغەڵ:** بنباخەڵ ف زیر بغل.
**بنبال:** ١) کەلەکە، خاڵیگە؛ ٢) نزیك، تەنشت ف ١) تهیگاه؛ ٢) نزدیك.
**بنبڕ:** قڕ، شوێنەوار بڕاو، کۆتایی‌هاتن: (خۆم کێشەکەم **بنبڕ** کرد) ف ریشه‌کن.
**بنبزو:** بن‌کلکی یەکسم ف زیردُم.
**بنبـزێو:** بەستـەو گۆرانی سوکـەڵەی خۆش کە گوێگر دەخاتە جوڵە ف آهنگِ رقص.

**بنبزێوکه:** بنبزێو ف آهنگ رقص.

**بنبەردۆك:** گیایەکە کوێستانی ف گیاهی کوهی.

**بنبەرەقی:** گیایەکە تامی ڕێواس دەدا ف گیاهی است بامزهٔ ریواس.

**بنبەلگ:** بن گەڵای توتن و هەرچی ف برگ زیرین بوتهٔ توتون.

**بنبەنگ:** بن گەڵای توتن ف برگ زیرین بوتهٔ توتون.

**بنبێژنگ:** بنژیل، ئەوی لەبێژنگ دەکەوێ ف تەنشین بیخته باغر بال.

**بن بێژینگ:** بن بێژنگ ف نگا: بنبێژنگ.

**بن بیف:** ڕێگەی دەسکرد بەبن عەرزدا، نەغمە ف نقب.

**بن پژان:** کچێنی لە دەست دان ف بکارت از دست دادن.

**بن پژانن:** کچێنی بردن ف بکارت برداشتن.

**بن پژاندن:** کچێنی بردن ف بکارت برداشتن.

**بن پشك:** کچێ ناودێرکرابێ کە بدرێ بەژن بۆ برای: (زارا بن پشكی شاهۆیە) ف دختری که بەعوض زن برادر نامزد شده باشد.

**بن پەڕ:** جۆرێ چەك ف نوعی اسحله.

**بن پەرگ:** ژێرچنی پەرگەمای کەڵاش ف حاشیه گیوه که بر آن تنند.

**بنپەل:** بن گەڵای توتن ف زیر برگ توتون.

**بنتا:** ١) تۆڵە نەمامی بێ لق و پۆپ؛ ٢) لق و چرۆی لەبنی دارەوە دەرچوە ف ١) نونهال؛ ٢) جوانه از بُن ساقه.

**بنتاتی:** جۆرێك ترێ ف نوعی انگور.

**بنتان:** لای ژێر وی پەرژین و تیغە دیوار ف پی پرچین یا تیغه.

**بنتاو:** بنتا ف نگا: بنتا.

**بنتل:** ١) یەکەمین گوێزی گوێزێن، سەرە؛ ٢) دیانە، ددانە، بەردێکی چوك دەخرێتە بن بەردێکی زل تا نەگلێ ف ١) گردوی اصلی گردوبازی؛ ٢) سنگی که زیر سنگ بزرگ نهند تا نلغزد.

**بنتەك:** لەتەنیشت ف در کنار.

**بنتیان:** هەڵوای بەبنی مەنجەڵەوە چەسپاو ف تەدیك حلوا.

**بنتیك:** درومانی کاتی کەجلدور دەیکا، پرۆ، پراوە ف پرو لباس.

**بنج:** بنەڕەت، ریشە ف ریشه.

**بنج داکوتان:** ریشە قایم کردن ف ریشه دوانیدن.

**بنجك:** پنجك، دەوەن، شخەڵ ف بوتهٔ درختی.

**بنجو:** کوڕەجوی نۆموسوڵمان ف بچه یهودی نومسلمان.

**بنجو بناوان:** بنەچەکەو بنەڕەت ف اصل و نسب.

**بنجوجکە:** کلێنچکە، ئێسکی قونی ف استخوان بیخ دُم.

**بنجۆری:** تۆژینەوەو لێ کۆڵینەوە ف پژوهش و تحقیق.

**بنچاخ:** قەباڵەی مڵك ف سند مالکیّت.

**بنچغ:** تەنشت، لا، بنهاڵ: (دەلە **بنچغم** لاکەوە!!) ف پهلو، جَنْب.

**بنچـك:** دەوەن، پنجـك: (پامەنێن وە**بنچك**، دەرتەفرێ مەلیچك) ف بُتّهٔ درختِ جنگلی.

**بنچل:** بنتا ف نگا: بنتا.

**بنچین:** رەگو ریشە ف رگ و ریشه، شاهرگ.

**بنچینە:** بناخە، هیم ف اساس، شالوده.

**بنخرمان:** بن جۆخین، بن کۆی خەرمان ف تهِ خرمَن.

**بن خەرمان:** بن خرمان ف تهِ خرمَن.

**بن داروك:** گیایەکە ف گیاهی است.

**بندرخە:** شەشەم حەوتەی زستان ف ششمین هفتهٔ زمستان.

**بندرو:** ١) درومانێ کە لەدەرەوە دیار نەبێ؛ ٢) دروێنە لەژێر وی چڵدان لە دروێنەدا؛ ٣) دادرونی زارکی تێر و جەواڵ تائەو جێی بکرێ و نەخلێ ف ١) دوختِ بسیار ریز؛ ٢) دروکـردنِ غلّه از بیخ؛ ٣) دوختنِ جوال طوری که غلّهٔ آن تکان نخورد.

**بندك:** ئەوشوێنەی تەوەرەی لەسەرە ف جای قطب در آسیاب.

**بندۆك:** ١) دۆك، ئەو سپیاتیەی کە لە رۆنی کەرە تاواندندا سەر دەکەوێ؛ ٢) شۆکە، ئەو لیجقە شیرنەی لەپەڵکی زرعات دەداو تاشیرنی دەکا، ئەو سپیاتیەی لەپەڵکی رەز ئەدا ف ١) سپیدكِ کره؛ ٢) سپیدكِ نباتات.

**بن دەس:** بن دەست ف پهلو، جَنْب.

**بن دەست:** ١) بن هەنگڵ؛ ٢) لەپەنا، زۆر نزیك کەدەست بیگاتێ ف ١) زیر بغل؛ ٢) دَمِ دست.

**بن دەق:** هەڕەت، جەنگە ف عُنفوان.

**بن دیان:** ١) بنی ددان؛ ٢) خاچ پەرستی نۆموسوڵمان ف ١) زیر دندان؛ ٢) مسیحی تازه مسلمان شده.

**بندین:** تەختی چۆم و روبار ف کَفِ رودخانه.

**بنڕدێن:** موی بەرچێڵەی پیاو ف موی زیر چانه.

**بنڕژان:** کچێنی لەدەس دان ف از بین رفتن بکارت.

**بنڕەخ:** بناغە، خیم، هیم ف اساس و شالوده.

**بنڕێسمە:** پاژنەی دەرگا ف پاشنهٔ در.

**بنڕیش:** بنڕدێن ف موی زیر چانه.

**بنژیل:** بن بێژنگ و خشت و خاڵی دەغڵ ف تەنشین غربال شده.

**بنفلە:** خاچ پەرستی نۆموسوڵمان ف مسیحی تازه مسلمان شده.

**بنفلەم:** بنفلە ف نگا: بنفلە.

**بنفەلە:** بنفلە ف نگا: بنفلە.

**بنقوڵ:** پاژێکە لەکراسی ژنان کە سەرقوڵی پێدا نەدرون ف پارچهٔ مثلثی از پیراهن زنانه که زیر بغل قرار می‌گیرد.

**بنك:** ١) ئاغزە جگەرە؛ ٢) هەرچێ کەوتوتە لای ژێر؛ ٣) کوتاڵ و ماڵی زۆری بازرگانی ف ١) فیلتر سیگار؛ ٢) طرفِ پایین؛ ٣) مالُ‌التجارهٔ زیاد.

**بنکدار:** بازرگانی کۆم فرۆش، بەرانبەری تاك فرۆش ف تاجر عمده فروش.

**بنکڕ:** شیر یا نان یا هەرچی کە بەبنی مەنجەڵەوە دەسوتێ و دەنوسێ ف تەدیك.

**بنکلك خوراندن:** فریودان بەقسەی خۆش ف فریب با زبان‌چربی.

**بنکلیشە:** ناولەش، بریەتی لە فکر و بیر ف اندرون، کنایه از فکر.

**بنکلیشەچون:** بریەتی لە فریودان و هانەدان ف کنایه از فریب دادن.

**بنکوش:** ژێرداوێن ف زیردامان.

**بنکۆشك:** هۆدەی ژێر زەمینی ف اطاق زیر زمینی.

**بنکۆڵ:** ١) لەبنەوە هەڵکەندنی دیوار بۆ روخانی؛ ٢) دانەوەی بنی رەزو توتن بۆ بەهێزبونی ف ١) از پی کنـدن دیوار بەقصـد تخریب؛ ٢)

گودکردن بُن مو و توتون برای شادابی آن.

**بنکه:** بنه، مه‌کۆگه، مه‌کۆ: (بنکه‌ی پێشمه‌رگه له‌چیای سه‌فینه) فا مقرّ.

**بنکه‌ش:** بنباخه‌ڵ، بنه‌نگڵ فا زیر بغل.

**بنکه‌شی:** درزو که‌لێن دادان فا منفذ و درزگیری.

**بنکه‌ڤیك:** گوڵه‌نه‌ورۆزه فا از گلهای نوروزی.

**بنکه‌ن:** بنکۆڵ فا نگا: بنکۆڵ.

**بنکه‌ند:** بنکۆڵ فا نگا: بنکۆڵ.

**بن که‌وش:** ١) ژێر پێڵاو؛ ٢) بنباخه‌ڵ فا ١) زیر کفش؛ ٢) زیر بغل.

**بن کێڵك:** دنه‌دان، هانه‌دان فا برانگیختن.

**بنگس:** بست، بۆست، بنگوس فا وجب.

**بنگست:** بنگس فا وجب.

**بن گلته:** مایه‌فتنه، سه‌ره‌سۆدره فا فتنه‌گر.

**بنگۆزه‌ڵه:** گیایه‌کی سه‌لکداری کوێسانه فا گیاهی کوهستانی است.

**بنگوست:** بنگس فا وَجَب.

**بنگـوڵ:** ١) گیایه‌کـه؛ ٢) دوهه‌م گوڵ له گۆره‌وی بازیدا فا ١) گیاهی است؛ ٢) اصطلاحی در جوراب‌بازی.

**بنگوفك:** هوڵه‌مه‌ڕ، ئاغه‌ڵی ئاژه‌ڵ فا آغُل.

**بنگوف:** بنگوفك فا آغُل.

**بنگه:** ١) بنه‌ڕه‌ت، بناغه؛ ٢) گه‌ی قامك؛ ٣) به‌ندو جمگه‌ی له‌ش فا ١) پایه و اساس؛ ٢) بند انگشت؛ ٣) مفاصل بدن.

**بن گیری:** دواکه‌وتن و لێ کۆڵینه‌وه، تاقیقات فا تحقیق و پیگیری.

**بنگێس:** بست، بۆست، بنگوس فا وَجَب.

**بن لق:** تۆڵێ له خواروی داره‌وه هاتبێ فا جوانه از پایین تنه.

**بنمێ:** ١) بخوسێ، به‌ئاو نه‌رم بیته‌وه: (چه‌رم بخه ئاوبا بنمێ)؛ ٢) فه‌رمانه بۆ خوساندن فا ١) خیس و نرم شود؛ ٢) بخیسان.

**بن‌میتانه:** ناحه‌سڵ، نانه‌جیب، ناکه‌س به‌چه فا بداصل، نانَجیب.

**بنمێنه:** بخوسێنه، بنمێ فا بخیسان.

**بنو:** بخه‌وه، بخه‌فه فا بخواب.

**بنواشه:** بناغه فا اساس.

**بنوڕ:** بڕوانه، ته‌ماشاکه فا نگاه کُن.

**بنوڕه:** بنوڕ، بدیه فا نگاه کُن.

**بنوس:** ١) نوسه‌ر، که‌سێ بزانێ بنوسێ و ده‌نوسێ؛ ٢) ئامرازی نوسین، قه‌ڵه‌م، ئالا فا ١) نویسنده؛ ٢) قلم.

**بنۆش:** وه‌خۆ، فڕکه، بی‌خۆره‌وه فا بیاشام.

**بنۆشه:** بنۆش فا بیاشام.

**بن‌وشکه:** نه‌خۆشی بێستان فا آفت پالیزی.

**بنۆك:** ١) گیایه‌که که بۆ ده‌رمانی ئاژه‌ڵ به‌کار دێ؛ ٢) قرپۆکی خوری له‌شانه دراو فا ١) گیاهی داروئی؛ ٢) بُنجُل پَشم.

**بنوه:** بخه‌وه فا بخواب.

**بنوێنه:** ١) شان‌بده، نیشان بده؛ ٢) بخه‌وێنه، ده‌خه‌وکه فا ١) نشان بده؛ ٢) بخوابان.

**بنـه:** ١) گای ناوه‌نـدی گێره، گای‌بنـه؛ ٢) پێداویستی سه‌فه‌ر: (بارگه‌و بنه‌ی تێکناوه)؛ ٣) حه‌شارگه‌ی که‌وی ڕاو؛ ٤) بنکه، مه‌قه‌ڕ؛ ٥) ڕه‌به‌ت، سپـه‌ی راوچی فا ١) گاوبُنـه؛ ٢) باروبُنـهٔ سفـر؛ ٣) بنـاهگاه کَبك شکاری؛ ٤) مَقَر؛ ٥) کمینگاه شکارچی.

**بنه‌باب:** ئاژدا، باپیران فا نیاکان.

**بنه‌بڕ:** بنبڕ فا نگا: بنبڕ.

**بنه‌به‌نگه:** بناوان فا سرچشمهٔ آب.

**بنـه‌پیت:** ١) ژێر خه‌رمـان؛ ٢) ده‌سمـایه، سه‌رمیان، سه‌رمایه فا ١) ته خرمن؛ ٢) سرمایه.

**بنه‌تا:** بنتا فا نگا: بنتا.

**بنه‌تۆ:** ئه‌وتۆمی چاندراوه یا ده‌چێندرێ فا تخم کاشت.

**بنه‌تۆ:** بنه‌تۆ فا تخم کاشت.

**بنه‌تۆم:** ١) بنه‌تۆ؛ ٢) نه‌ژادو ڕه‌چه‌ڵه‌ك فا ١) تخم کاشت؛ ٢) اصل و نژاد.

**بنه‌تۆمه:** بنه‌تۆم فا تخم کاشت.

**بنه‌تۆو:** بنه‌تۆ فا تخم کاشت.

**بنه‌تۆوه:** بنه‌تۆ فا تخم کاشت.

**بنه‌جو:** بنجو فا نگا: بنجو.

**بنه‌جوت:** ١) که‌ل‌په‌لی زه‌وی کێڵان؛ ٢) داهاتی ساڵانه‌ی زه‌وی فا ١) وسایل کشاورزی؛ ٢) بهرهٔ سالانه.

**بنه‌چڵ:** شاره‌گ و ڕیشه‌ی گیاو دار فا شاهرگ و ریشهٔ اصلی درخت.

**بنه‌چه:** بنه‌چه‌که، بابو باپیران فا اصل و نَسَب.

**بنه‌چه‌که:** بنه‌چه فا اصل و نَسَب.

**بنه‌خڵ:** بن‌باخه‌ڵ فا زیر بغل.

**بنه‌ڕوك:** بنوك فا نگا: بنوك.

**بنه‌ڕه‌ت:** ١) بناخه؛ ٢) ڕه‌گه‌ز، بنه‌چه فا ١) پایه و اساس؛ ٢) اصل و نسب.

**بنـه‌فش:** ١) گوڵی وه‌نـه‌وشـه؛ ٢) ڕه‌نگی وه‌نـه‌وشی فا ١) بنفشه؛ ٢) به‌رنگ بنفشه.

**بنه‌فشۆك:** گوڵێکه به ڕه‌نگ و ته‌رح له وه‌نه‌وشه ده‌کا فا گلی است بنفشه مانند.

**بنه‌ڤان:** بناوانی ماڵ فا خانه‌دار.

**بنه‌قه‌ر:** گای بنه فا گاوبُنه در خرمن کوبی.

**بنه‌کردن:** ١) هه‌ڵنانی ماڵ بۆ دزی؛ ٢) سۆراغ کردنی ماڵی دزراو فا ١) خانه‌ای را برای دزدی زیرنظر گرفتن؛ ٢) سرنخ دُزدی را پیدا کردن.

**بنه‌گا:** جێ‌هه‌وار له زۆزانان فا منزلگاه ییلاقی.

**بنه‌ما:** ماکه، هۆی پەیدابون و مان فا ماده.

**بنه‌ماڵ:** خانه‌دان، گه‌وره‌ماڵ فا خاندان.

**بنه‌ماڵه:** خانه‌دان له‌مێژینه‌وه فا خاندان.

**بنه‌نگڵ:** بنباخه‌ڵ فا زیر بغل.

**بنه‌وا:** ئاگاداری ناوماڵ، بناوان فا خانه‌دار.

**بنه‌وان:** بنه‌وا فا خانه‌دار.

**بنه‌وانه:** بنه‌وا فا خانه‌دار.

**بنەوش:** رەنگی بنەوشە، بەنەوش ف بَنَفش.

**بنـەوشـان:** قەزوانی نە فەریكو نە رەق كە تیكولّی شینی ئامالّ سورە، وەنەتەقیّ تەواو نەگەیویّت ف نانِكش تمام نرسیده.

**بنـەوشە:** ١) گولّی وەنەوشە؛ ٢) قوماشیّكە رەنگ وەنەوش ف ١) گُلِ بنفشه؛ ٢) قماشی بەرنگِ بَنَفش.

**بنەوشیلە:** جۆرە قەزوانیّكی وردە ف نوعی جاتلانقوشِ ریز.

**بنـەوە:** ١) ژێر و، بەرانبـەری سەرەوە؛ ٢) دانەویّ، داوەرەوە، بچەمە؛ ٣) پڕ پیّداكە: (لیّ بنەوەو ببوە) ف ١) زیرین؛ ٢) *اَمر:* خم‌شو؛ ٣) *امر:* زود بردار.

**بنەوەر:** گای بنە ف گاو بُنە در خَرمَن‌كوبی.

**بنەویّنە:** خوارکەوە، لاركەوە، بچەمیّنە، داهیّنە ف خم‌كُن.

**بن‌هەنگلّ:** بن‌باخەلّ ف زیر بغل.

**بنیّ:** ١) بڕوانە؛ ٢) دانیّ: (دەست **بنیّ**بان سەرم) ف ١) نگاه كن؛ ٢) بگذار.

**بنیات:** ١) بنەڕەت، هیم، بناخە؛ ٢) ئیجاد، سازدان ف ١) شالودە؛ ٢) ایجاد.

**بنیچە:** بنەچەكە، رەچەلاّك ف اصل و نژاد.

**بنیّڕ:** بنۆڕ، بنوارە، بڕوانە ف نگاه كن.

**بنیّرە:** ١) بەڕیّ‌بكە؛ ٢) راسپیّرە ف ١) بفرست؛ ٢) سفارش كُن.

**بنیسك:** سونكە سابون، سویّنكە سابون ف ماندە صابون.

**بنیسكە:** بنیسك ف ماندهٔ صابون.

**بنیّسی:** نەخۆشی لەڕبون ف مرضِ لاغری.

**بنیش:** رۆنیشە، دانیشە ف بنشین.

**بنیشت:** شیلەی دارەبەن، جاچكە ف سَقز.

**بنیشت:** بنیشت ف سقز.

**بنیشتەتالّ:** جاجكەتالّە ف سقز تلخ.

**بنیّشتەتالّ:** بنیشتی نەكولاّوی خۆش‌نەكراو ف سَقز تلخ.

**بنیشتەتالّە:** بنیشتەتالّ ف سَقز تلخ.

**بنیّشتەتالّە:** بنیشتەتالّ ف سقز تلخ.

**بنیلە:** دەغلّی بەر گیّرە ف خرمنِ در حال كوفتن.

**بنیەش:** بنیە، بینیّ ف بُگذار.

**بو:** ١) بەهرەی زەمین: (زەویەكی بەبەرو بوە)؛ ٢) هەبو، بەرانبەری نەبو؛ ٣) كوند، كوندەبو؛ ٤) ئەبم، ئەوم ف ١) بهرهٔ زمین؛ ٢) بود؛ ٣) بوم، جُغد؛ ٤) می‌شوم.

**بۆ:** ١) پیتو بارەی زەوی؛ ٢) ولاّت، سەرزەمین: (هەر تۆم خۆش دەویّ لەم هەردو بۆیە)؛ ٣) بۆن، بیّن: (ئەو سەرزەمینەی بۆی تۆی لیّ‌نایە / ئاوری تیّ‌بەربیّ هەرشەو لەلایە) «فولكلۆر»؛ ٤) لەبەر، بەخاتر: (بۆتۆ كە بیكرو تازە وەكو حۆری جەننەتی / قەیدی چیە عەجوزەیی دنیا بدەم تەلاّق) «نـالی»؛ ٥) وەرە، بیّ؛ ٦) كونـد، بایەقوش؛ ٧) شاگرد مەیخانە؛ ٨) دیّراو، خەتی قولّ بۆ ئاوداشتن؛ ٩) شیان، توانست: (بۆم ناكریّ، بۆم نالویّ)؛ ١٠) بۆچی؟؛ ١١) ئەبیّ، ئەویّ؛ ف ١) بهرهٔ زمین؛ ٢) سرزمین؛ ٣) بو، رایحـە؛ ٤) بخـاطـر؛ ٥) بیا؛ ٦) بوم، جغد؛ ٧) شاگرد میخانە؛ ٨) جوبِ آبیاری؛ ٩) امكان؛ ١٠) چرا؛ ١١) می‌شود.

**بوار:** ١) بەهار؛ ٢) دەراوی پەڕینەوە؛ ٣) دەرەتانی دەرچونو تیّپەڕین ف ١) بهار؛ ٢) گُدار؛ ٣) مَفَرّ گُریز.

**بواردن:** ١) بگـاردن؛ ٢) لیّ هەلّبواردن؛ ٣) رەنگداربونی پارچە ف ١) گُذشتن؛ ٢) اِهمال؛ ٣) رنگی شدن پارچه.

**بوارە:** دەرفەت، فرسەت، ماوە ف فُرصت، مجال.

**بواژو:** بۆژۆ، گیای بۆن‌گرتو كە مالاّت نایخوا ف علف بوگرفته.

**بوان:** ئەستوندەكی چادر ف ستون خیمه.

**بوایت:** ١) ببوایە؛ ٢) بوبایت، تۆبوایت ف ١) می‌بود؛ ٢) می‌بودی.

**بوبا:** هەبوایە ف می‌بود.

**بۆبا:** نقیشكی بۆن‌گرتو ف روغن یا كرهٔ بوگرفته.

**بوبان:** ١) ببونایە؛ ٢) نیّوی گوندیّكە ف ١) می‌بودند؛ ٢) اسم روستائی.

**بۆبڕە:** بۆچنە، ئەوشتەی بۆنی ناخۆش ناهیّلّیّ ف بوگیر.

**بۆبلات:** كارەسات، بەلاّو چۆرتم ف بلا و مُصیبَت.

**بۆپڕوز:** بۆكڕوز، بۆنی سوتاوی ئیّسكو مو ف بوی مو و استخوان سوخته.

**بوت:** بت، پت، خوای دەسكرد ف بُت.

**بۆت:** ١) بانیژەی تاش، بانجیلەی ئاساو؛ ٢) ئاوبارە، قەمتەرە؛ ٣) بۆتو، بوتە: (**بۆت** ناهیّنم) ف ١) بامِك آسیاب؛ ٢) قنطرە؛ ٣) برای تو.

**بۆترەكیّنە:** كارگی بالاّبەرزی سەرخڕ ف نوعی قارچ.

**بۆتك:** ئاوبارە، بۆت ف قنطره.

**بۆتكە:** خانوی لەدارو تەنەكە ف كلبهٔ از چوب و حَلَب.

**بوتری:** بتری، شوشەی دەم تەنگ بۆ تراو تیّكردن ف بطری.

**بوتلّ:** بوتری ف بطری.

**بۆتۆ:** بۆت ف برای تو.

**بۆتە:** ١) بلّندایی كەم لەزەمیندا، زەقایی زەوی؛ ٢) دەفریّ كە كانزای تیّدا دەتاویّننەوە؛ ٣) بۆتو، بۆت ف ١) برجستگی در سطح زمین؛ ٢) بوتهٔ ریخته‌گری؛ ٣) برای تو.

**بۆتەگە:** بۆدڕن، ئەوبۆیەی وەختی تیّ‌بەردان لەسابڕین تیّ ف بوی بُزِ نر هنگامِ جُفتگیری.

**بۆتی:** ١) خەلّكی ولاّتی بۆتان، بۆتانی؛ ٢) بۆ تۆی: (هەر ناوی بهیّنی **بۆتی** دیّنم) «مەم وزین» ف ١) اهل منطقهٔ بوتان؛ ٢) برایت.

**بۆتیمـــار:** شاهـــۆ، بالـداریّكی ملو قاچ دریّژە هەر لە دەم ئاوان دەبیّ، شاوەشینكە ف بوتیمار.

**بۆج:** فیز، دەعیە، ئیفادە ف فیس و تكبّر.

**بۆچ:** ١) لەبەرچی؟ ئەڕا؟؛ ٢) بریّتی‌لە قوز ف ١) برای چی؛ ٢) فَرجِ زن.

**بۆچالّ:** دەغلّی بۆن تەڕگرتو لە چالّدا ف غلّەای كە در خاك بوی تری گرفته باشد.

**بوچان:** گچكۆلّە، بیچكەلاّنە، بچكۆك ف كوچولو.

**بۆچڕ:** بۆن دوكەلّ، بیّهنا كادو ف بوی كاه سوخته.

**بۆچروك:** بۆنی سوتاوی چەوری ف بوی چربی سوخته.

**بوُچك:** بچکۆك ف کوچك.

**بوچکه:** بوُچك ف کوچك.

**بوچکەلانه:** بچکۆلانه ف کوچولو.

**بۆچـون:** ۱) بیر بـردن: (من وای بۆچـوم که نایەتـەوە)؛ ۲) بەرەو شتێ یاکەسێ ڕویشتن ف ۱) گمان بُردن؛ ۲) بطرفِ کس یا چیزی رفتن.

**بۆچه:** بۆ چ ف چرا؟.

**بۆچەك:** بۆچروك ف بوی چربی سوخته.

**بۆچه کەهـور:** بۆ چروکی قـەوی، بۆچەکـەوڕ ف بوی شدیـد چربی سوخته.

**بۆچه کەوڕ:** بۆ چروکی زۆر ف نگا: بۆچه کەهوڕ.

**بۆچی:** بۆ چ؟ ف چرا؟.

**بوخ:** ۱) هەڵم؛ ۲) تەم لەگەرمادا ف ۱) بُخار؛ ۲) دَمَه از گرما.

**بوخار:** بوخ ف بُخار.

**بوخاری:** مغاری، بخاری ف بُخاری.

**بوختان:** هەڵبەسته، تۆمەت، ئیفتیرا ف بُهتان.

**بوختیان:** بوختان ف بُهتان.

**بوخچك:** بوخچەی بچوك، پرێسکەی گەوره ف بُقچۀ کوچك.

**بۆخچـــه:** ۱) پارچـه چوارگۆشـەیەك بۆ کەل‌و پەل تێنـان: («**بوخچـه بگـەردانێ**»: *گاڵتـەی پرێسکـه هاویشتن*)، («**بـوخچـەی نەکراوه**»: *بریەتی لە لاوی عازەب*)؛ ۲) باخچه ف ۱) بُقچه؛ ۲) باغچه.

**بوخورد:** بخوُر ف بُخور.

**بوخوردان:** بخوُردان ف بُخوردان.

**بۆخـۆشکه:** ۱) دارێکی لێرەواره؛ ۲) گوڵی کەنێره ف ۱) درختی است جنگلی؛ ۲) گُلی وحشی.

**بۆخـۆیی:** بێخـوێ‌یی، دەردێکه لە بێخەویەوه توُشی چاو دێ ف نوعی بیماری چشم که بر اثر بی‌خوابی عارض شود.

**بوُد:** دەوڵەمەند، دارا ف ثروتمند، دارا.

**بۆدان:** دانەوێڵه لەسەر ساج برژاندن ف بودادن حبوبات برساج.

**بۆدانەوه:** وام لەجیاتیان دان ف وام دیگری را پرداختن.

**بۆدڕ:** ۱) بۆنی توندی ماسی‌و تەگه؛ ۲) بۆنی ئارەقەی بنەنگڵ‌و قاچ ف ۱) بوی تند ماهی و بُز نر؛ ۲) بوی عرقِ زیر بغل.

**بوُدڕ:** ڕەهـــۆڵ، کون‌و دادڕاوی هەراو لەزەوی، کەنـــداڵ ف شکـاف و سوراخ در زمین.

**بۆدڕن:** بۆدڕ ف نگا: بۆدڕ.

**بۆدراو:** چێشتی قاوتی گەنمی برژاو ف آشِ گندُمِ بوداده.

**بۆدوُکەڵ:** بۆن کادو ف بویِ دودگرفته.

**بوُده:** بوُد ف ثروتمند.

**بودەڵه:** پیاوی بێ‌نمودی تەمەڵ‌و بێکاره ف مَردِ بدشکل و تنبل.

**بۆدی:** بەمانای فێڵ‌و گەڕ: (خەریکی دۆدی بۆدیه) ف تقلُّب و مکر.

**بودینه:** پنگه، پنگ، پونگ ف پونه.

**بوڕ:** ۱) بوار، بگار؛ ۲) بڕی قومار ف ۱) گُدار؛ ۲) بُرّ ورَق.

**بوُر:** ۱) زەمینی نەکێڵدراو؛ ۲) ڕەنگی سپی ئامـــاڵ زەرد ف ۱) بایر؛ ۲) رنگِ سفید شکری.

**بوُڕ:** خۆڵەمیش، بوُڵ ف خاکستر.

**بۆر:** ۱) بەر، بزاوی لێوپـێکـــەوەنـــان لە ئەلف‌و بێتکـــەدا؛ ۲) ڕەنگی خۆڵـەمێشی؛ ۳) یەکسمی پنۆك پنۆکی ڕەش‌و سپی ف ۱) ضمّه؛ ۲) رنگِ خاکستری؛ ۳) اسبِ خاکستری با لکۀ سفید.

**بۆڕ:** ۱) تێشکـــاو لە ملەو کێ بەرکێدا: (بـۆڕت خوارد، بۆڕم دای)؛ ۲) لەشلکی‌و جوانی تێ‌پەڕین: (مـــام پیرۆت بۆڕ بوه، کەنگـــر بۆڕ بوه بۆخواردن نابێ)؛ ۳) قوڵکەی میوه کە گەڵای تێدا ڕاده خەن‌و بە گەڵا دای دەپـۆشن، تەره؛ ۴) گیایەکی باڵا بڵندی گەڵا دەرزی لە تیرەی هەڵـزو کەما؛ ۵) شەپۆلی ئاو ف ۱) بازندۀ مسابقه؛ ۲) پیرشُدن و از تراوت افتادن؛ ۳) چالەای که میوه را در آن ریزند تا رسیده شود؛ ۴) گیاهی برگ‌سوزنی؛ ۵) مَوج.

**بۆڕ:** ببڕ ف بُرّنده.

**بۆراق:** چاوزەق، چاوزاق ف چشم برجسته.

**بۆران:** تۆف، کرێوەو بادەوه ف طوفان.

**بۆڕان:** قوڕەی ڕەشەوڵاغ. («**بۆڕاندن**»: بۆڕەکردن) ف صدای گاو و گوساله.

**بورانەوه:** دڵ لەخۆ چوُن، لەسەر خۆ چون ف از حال رفتن.

**بۆرانی:** ۱) چێشتی کوُلـەکـەو ماست؛ ۲) چیشتی بامجـان‌و کولەکەو توماتێزو قیمه ف ۱) آش ماست با کدو؛ ۲) بورانی.

**بۆراو:** بۆدراو، چێشتی گەنمی برژاوو گوتراو ف نگا: بۆدراو.

**بۆرباو:** ئاماڵ بۆر ف مایل به خاکستری.

**بورج:** برج ف بُرج.

**بۆرچیل:** ڕەشی ئاماڵ بۆر ف سیاه مایل به خاکستری.

**بۆرچین:** مێچکه مراوی ماڵی ف مرغابیِ ماده.

**بوُردن:** ۱) بەخشین، عافوکردن؛ ۲) ڕابردن، تێ‌پەڕین؛ ۳) زۆرگەیشتن‌و بڵ‌بوُنی کاڵەك‌و شوتی ف ۱) بخشودن؛ ۲) گذشتن؛ ۳) رسیدنِ زیاده از حدّ میوۀ جالیزی.

**بوردنەوه:** بوُرانەوه ف از هوش رفتن.

**بۆردومان:** بۆمباباران ف بُمباران.

**بۆرژان:** بیرەخەو، نێوان بێداری‌و خەو، سوکەڵەخەو ف پینَکی.

**بورغو:** برغی ف میخ‌پیچ.

**بورغی:** برغو ف میخ‌پیچ.

**بورگ:** برۆ ف ابرو.

**بورگه:** بانو ف فلات.

**بورمان:** دەنکه هەناری وشك ف دانۀ اَنارِ خُشك.

**بۆرمس:** بزنی ڕەشی ڕارای‌سپی تێدابێ ف بُزِ اَبْلَق.

**بۆڕه:** دەنگی بەرزی گاو گۆل ف صدای گاو و گوساله.

**بۆره:** ۱) ئەسپی پنۆك سپی‌و ڕەش، بۆر؛ ۲) بخۆ، بلەوەڕه؛ ۳) وەره؛ ۴) ڕەمـەکی‌و سەرنەناس: (بۆرەپیاگ)؛ ۵) زەمینی نەکێڵدراو؛ ۶) نێوی سەگانه ف ۱) اسبِ خاکستری لکەلکه سفید؛ ۲) بخور، بچَر؛ ۳) بیا؛ ۴) بداصل و نانجیب؛ ۵) زمین بایر؛ ۶) اسمی برای سگ.

**بۆره:** زەمینی نەکێڵدراو ف زمینِ بایر.
**بۆره:** وەرە، بێ ف بیا.
**بۆرەبنار:** نیوەشەڕ، کێشەی هەربەدەم ف جدال لفظی.
**بۆرەبۆڕ:** هاواری گاو گۆلك ف صدای بُلندِ گاو و گوساله.
**بۆرەپنە:** قەلەسابونە ف کلاغ.
**بۆرەپیاگ:** پیاگی رەمەکیو سەرنەناس ف مرد عامی و گم‌نام.
**بۆرەپیاو:** بۆرەپیاگ ف نگا: بۆرەپیاگ.
**بۆرەجورە:** جۆرێ جورەیە، بێ کاکوڵ ف نوعی پرنده.
**بۆرەخزم:** خزمێکی دور ف خویشاوندِ دور.
**بۆرەزەلام:** تەژەی ناقوڵا ف شخص تنومند و بدقیافه.
**بۆرەسوار:** سواری ئەسپی بۆرە ف سوار بر اسبِ بور.
**بۆرەقانی:** گیایەکە سوڕنەکرێتەوە بۆخواردن ف گیاهی که می‌پَزَند و می‌خورند.
**بۆرەقنە:** ئامالْ‌بۆر ف مایل به رنگ بور.
**بۆرەك:** ١) مەلێکی رەنـگ بۆرە؛ ٢) خواردنیکـە لەهێلکـەو ئاردو قیمە سازدەکرێ؛ ٣) جۆرێك گەچ ف ١) پرنده‌ایست؛ ٢) خوراکی از آرد و تخم‌مرغ و قیمه؛ ٣) نوعی گچ.
**بۆرەکی:** بۆرباو ف مایل به خاکستری.
**بۆرەلوك:** ئامالْ بۆر ف مایل به خاکستری.
**بۆری:** ١) رەنگی بۆر؛ ٢) لولەو شێرەی ئاو ف ١) رنگِ طوسی؛ ٢) لوله و شیرِ آب.
**بۆرێ:** وەرە، بێ ف بیا.
**بۆڕی:** ١) کەڕەنـا، شەیپور؛ ٢) دوکەڵ کێشی سەماوەر ف ١) کَرَنا؛ ٢) دودکش سماور.
**بۆریژانـگ:** بیژان، گیایەکی دەستەبالایە گوڵی زەرد ئەکا ف گیاهی با گلهای زرد.
**بۆڕی ژەن:** کەڕەناچی، شەیپورچی ف شیپورچی.
**بوڕێش:** بروش، برویش، ساوەری ورد ف ریزه‌بلغور.
**بۆڕین:** ١) هەڵگەڕانی شیر؛ ٢) بۆڕاندنی گاو گوێلك ف ١) فاسد شدنِ شیر؛ ٢) صدای گاو و گوساله.
**بۆڕێن:** کێ‌بەرکێ، رکە، ملە ف مسابقه.
**بۆرین:** ١) ڕابردن؛ ٢) عافوکردن ف ١) گذشتن؛ ٢) عفوکردن.
**بۆریە:** لولەی ئاو ف لولۀ آب.
**بۆڕیە:** ١) کەڕەنـــاو شەیپـور؛ ٢) مزرەقی ناوهڵۆڵ ف ١) شیپـور؛ ٢) گردنای میان‌تُهی.
**بۆڕیەژەن:** بۆڕیژەن ف شیپورچی.
**بۆز:** ١) بقز، دارتۆفانە، دارێکە بەرێك دەگرێ پڕیە لە مێشوڵە؛ ٢) لوان: (بۆم بوزناخوا) ف ١) درخت پشه؛ ٢) امکان.
**بۆز:** ١) شینی ئامالْ‌سپی؛ ٢) ریشی ماش‌و برنجی، سپی‌و رەش تێکەڵ؛ ٣) نەخۆشی جۆکی ئاژەڵ ف ١) کبود؛ ٢) ریش جوگندمی؛ ٣) نوعی بیماری زانوی دام.
**بوزو:** شاڵ، تەناوی جوڵا لەخوری‌و مەرەز ف شالِ دستبافِ محلی.

**بۆزە:** بۆز ف نگا: بۆز.
**بۆزەم:** بمخە: (ئازیز وەس بۆزەم نەگێجاو خەم) «مەولەوی» ف مرا بینداز.
**بۆزەن:** زۆر بەبۆن، بۆنکەر ف دارای شامّۀ قوی.
**بۆژان:** هەڵدان، بەخۆداهاتن ف نموّ کردن، بالیدن.
**بۆژانگـە:** جێ سانەوەی نەخۆشی تازە لە جێ هەستاو ف استراحتگاه دورۀ نقاهت.
**بوژانــە:** بیژان، گیایەکی گوڵ‌زەردی بۆن توندە مێشی لەبەر هەڵدێ ف نگا: بیژان.
**بوژانەوە:** وەکەیف‌کەوتن لەپاش لەڕیو کەساسی ف انتعاش، به نشاط آمدن.
**بۆژۆ:** ١) گیای بۆنگرتو کە مالات نایخوا؛ ٢) بوزو ف ١) عَلَفِ بوزده؛ ٢) نگا: بوزو.
**بۆژە:** بۆژۆ ف نگا: بۆژۆ.
**بۆژەکـردن:** بێزکردنی حەیوان لەگیای بۆژۆ ف اباکردنِ دام از خوردنِ عَلَفِ بوزده.
**بۆسار:** بۆسارد ف بوی نا.
**بۆسارد:** ١) بۆ گنخاو؛ ٢) بۆن‌گرتو، بۆگەن ف ـ ١) بوی نا؛ ٢) بوی گَند.
**بۆس:** بۆست، بنگس ف وجب.
**بۆسان:** بیـــتان. باغ ف بوستان، باغ.
**بۆست:** بنگس، بۆس ف وجب.
**بۆسـۆ:** ١) بۆنی لۆکـەی سوتـاو: (ئـاورم تێ‌بەردە، بۆسۆم لێ‌نایە)؛ ٢) پەڕۆی تازەسوتاو لەسەربرینی تازەدەنێن خوێنەکەی دەبەستێ ف ١) بوی پنبۀ سوخته؛ ٢) تکه پارچۀ پنبه‌ای که می‌سوزانند و بر زخم تازه می‌گذارند تا خون را بند آورد.
**بۆسە:** ١) سیپە، رەبەت، کەمین، مردەو زیندە؛ ٢) قایشی جوت‌لەدار ف ١) کمین شکارچی؛ ٢) رابطِ بین یوغ و خیش.
**بوسە:** ١) پشودانێکی کورت؛ ٢) بوێستە، ڕاوێستە؛ ٣) بخەوە، بنوە ف ١) توقّفِ کوتاه؛ ٢) بایست؛ ٣) بخواب.
**بۆسەخواردن:** لەبۆسەدا خۆمات کردن ف کمین گرفتن.
**بۆسە گرتن:** بۆسە خواردن ف کمین گرفتن.
**بۆسەلی:** جۆرێ ترێ ف نوعی انگور.
**بۆش:** ١) ناوبـەتـاڵ، کلۆر، هلۆڵ؛ ٢) زۆر: (لەشکرە کە بۆشە، خوارن بۆش‌بو)؛ ٣) تێکـەڵ پێکـەڵی خەڵك ف ١) میان‌تُهی؛ ٢) بسیار؛ ٣) شلوغی مردُم.
**بۆشایی:** بەتاڵایی، والایی ف کاواك.
**بۆشکە:** بەرمیل، دەفری زۆرگەورە بۆ تراو ف بُشکه.
**بۆشناغ:** کۆك‌و پۆشتە ف شیك‌پوش.
**بۆغ:** بۆخ ف بُخار.
**بوغاف:** گیایەکە بەشاخانەوە دەڕوێ ف گیاهی است که بر صخره‌ها روید.

**بوغز:** رك: (**بوغز** لەزگ) ف خشم و کین.

**بۆغمە:** ١) وس بە، دەمت بگرە؛ ٢) نەخۆشی دوشاخە ف ١) *فعل امر*: خاموش باش؛ ٢) بیماریِ خناق.

**بوغە:** گای زۆر قەڵەوی غللور: (چەند قەڵەوە دەڵێی گای **بوغەیە**؟!) ف گاو فربە و مغرور.

**بۆق:** ١) قۆرواق، بەق؛ ٢) کەڵەشاخ بۆ تێ‌تورڕاندن؛ ٣) چاوی زەق؛ ٤) پشت مل؛ ٥) پاڵ، دەڵەك: (بۆچە **بۆقم** ئەدەی: پاڵم پێوە دەنێی؟)؛ ٦) نێرتکی چلەپیازو سیر ف ١) قورباغە؛ ٢) بوق؛ ٣) چشم برجستە؛ ٤) پشتِ گردن؛ ٥) هُل؛ ٦) نرّهِ پیاز و سیر.

**بۆقدان:** دەڵەکدان، پاڵ‌پێوەنان ف هُل دادن.

**بۆقژە:** نەخۆشی زاری زارۆکانە ف بیماری دهن بچە.

**بۆقل:** گۆشتی بەلەك ف گوشتِ ساقِ پا.

**بۆقلە:** قەلەمونە، عەلی شیش، قەل، بەقلە ف بوقلمون.

**بۆقلەموت:** بۆقلە ف بوقلمون.

**بۆقلەمون:** بۆقلە ف بوقلمون.

**بۆق‌مل:** پشت مل ف پشت گردن.

**بۆقە:** دەنگی گای کەمتر لەبۆڕە ف صدای گاو.

**بۆقـەتـە:** پشت مل: (موی حەوسەد وشتر ئەم‌کرد وەجلی / هێشتا هەر دیاربو **بۆقەتەی** ملی) «کەرکوژ» ف پُشت گردن.

**بۆقەمەلە:** جۆرێ مەلەی وەك بۆق ف شنای قورباغە.

**بۆقی‌مل:** پشت مل ف پُشت گردن.

**بوُك:** ١) وەوی؛ ٢) رەبـەنۆك، گولاڵەسوُرە؛ ٣) پیاوەدارینە، بوکەبارانە؛ ٤) باپشکێو، چنچکە سلاو ف ١) عروس؛ ٢) آلالە؛ ٣) آدمكِ چوبی؛ ٤) گُل‌مژە.

**بوك‌بوکێنە:** گاڵتەی منالان بە بوکەڵەی لەیستۆك ف عروسك بازی.

**بۆکرد گ:** بۆنگرتو، گنخاو ف بوگرفتە.

**بۆکردن:** ١) گنخان؛ ٢) بۆن هەلمژین، بۆنکردن ف ١) بوگرفتن؛ ٢) بوکردن.

**بۆکرۆز:** بۆنی ئێسکی سوتاو ف بوی استخوانِ سوختە.

**بۆکز:** بۆنی گۆشتی سوتاو ف بوی گوشت سوختە.

**بوکك:** چینچکە سلاو، باپشکێو ف گُل‌مژە.

**بوکڵە:** بوکەڵەی منالان ف عروسك.

**بۆکلیشە:** بۆنی بن‌باخەڵ‌و قاچ ف بوی بد پا و بغل.

**بوُکەبارانە:** کۆتەڵێ کە منال ئەگێڕن بەماڵانەوە، ناوی پێدا دەکرێ ف آدمك چوبی.

**بوُکەبارانێ:** بوکەبارانە ف آدمك چوبی.

**بوُکەبەبارانە:** بوکەبارانە ف آدمك چوبی.

**بوُکە بەبارانێ:** بوکەبارانە ف آدمك چوبی.

**بوُکە سەماکەرە:** بوتەکێ ف نوعی عروسك خیمەشب بازی.

**بوُکـەشـوشە:** بوُکڵەی لەچینی یان شوشە ف عروسك ساختە شدە از چینی یا شیشە.

**بوُکەڵە:** بوکی لەیستۆکی منداڵان، بوکڵە ف عروسك.

**بۆگنتك:** بۆنی میوەی رزیو ف بوی میوە فاسدشُدە.

**بۆگنخ:** بۆگنخاو ف بوی نا.

**بۆگنخاو:** بۆنی دانە وێڵەی شەدارو رزیو ف بوی نا.

**بۆگە:** گیای بۆن‌گرتو کەئاژەڵ نایخوا ف نگا: بۆژ.

**بۆگەمرخە:** بۆگنخ ف بوی نا.

**بۆگەن:** بۆن ناخۆش: (ئەم ماسیە **بۆگەن** بوە، دوڕۆژە **بۆگەنی** کردوە) ف بوی گند.

**بۆگـەنکە:** ١) فسوس، جانەوەرێکە لەرێوی چوکە تر هیچ جانەوەرێك لەتـرسی بۆگەنـەکەی ناوێرێ توخنی کەوێ؛ ٢) گیابۆگەنیوە ف ١) حیوانی است بسیار بدبو؛ ٢) نوعی گیاه بدبو.

**بۆگەنیو:** بۆنی ناخۆش ف بوی گند.

**بۆگەنیوە:** گیا بۆگەنکە ف نوعی گیاه بدبو.

**بۆڵ:** ١) دەنکی ترێ، دانە هەنگور، لبەتری؛ ٢) زەنگی ملی پێشەنگ؛ ٣) دۆڵی تەنـــگ، دەرەی ناو دوکێو، گەلی، بوهـل؛ ٤) خوڵـەکـەوە، مشکی؛ ٥) ئاوتێزاو: (تـرێ‌**بۆڵ** بوە) ف ١) دانـە انگـور؛ ٢) زنـگِ کاروان؛ ٣) درّهٔ تنگ؛ ٤) خاکستر؛ ٥) آبدار.

**بوُڵ:** خوڵەمێش، مشکی، خوڵی ف خاکستر.

**بۆلاندن:** ورتەورتی گلەیی ف غرولند کردن.

**بوُڵاو:** خوڵیاف، مشکی‌و ئاوی لێك‌دراو ف خاکستر آب.

**بۆڵ بزمارە:** جۆرێ ترێ ف نوعی انگور.

**بۆڵ مازو:** جۆرێ ترێ ف نوعی انگور.

**بۆڵە:** ١) ورتەو پرتەی توُڕەیی؛ ٢) مشکی، خوڵی ف ١) غرولند کردن؛ ٢) خاکستر.

**بۆڵەبۆڵ:** پرتەپرت، بۆڵەی زۆر ف غرولند.

**بۆڵە تەمێ:** ئاڵ‌و بۆڵ ف نگا: ئاڵ و بۆڵ.

**بوُڵەرە:** بومەلەرزە، زەلزەلە، هەژانی زەمین ف زلزلە.

**بۆڵەمڕ:** ژیلەمۆ، ژیلە ف خاکستر گرم.

**بۆڵەنمە:** ئاوتێگەڕانی میوە، ئاڵوبۆڵ ف میوهٔ نزدیك بە رسیدن.

**بۆڵەنمێ:** بۆڵەنمە ف نگا: بۆڵەنمە.

**بوُڵـەوەرە:** تیژاوی، خوڵـەمێش کە جانەوەری مێملی داری پێ لەناو دەبەن ف تیزابِ خاکستر.

**بۆڵی:** ١) دەنکـەتـرێ، بۆڵ؛ ٢) هۆزێکی کۆچـەری کوردە ف ١) دانهٔ انگور؛ ٢) یکی از عشیرتهای کُرد.

**بوُڵێڵە:** نێوان شەوو ڕۆژان، تاریکی و ڕۆشناکی تێکەڵ لە ئێوارو بەیاندا ف هوا گرگ و میش.

**بۆم:** ١) بۆمبا؛ ٢) ئەڕای من؛ ٣) سەرزەمین ف ١) بُمب؛ ٢) برای من؛ ٣) سرزمین.

**بوُم:** ١) تەشـوێ؛ ٢) هەبوم؛ ٣) کوندی‌زل، کوندەبوم ف ١) تیشە؛ ٢) بودم؛ ٣) بوف.

**بۆمارانە:** گیایەکی دەرمانەو زۆر تاڵە ف گیاه بوماران، علفِ هزار برگ.

**بۆمبا:** گوللەی زەلامی فڕۆکە ف بُمب.

**بۆمباباران:** بۆمبا هاویشتن ف بُمباران.

**بۆمباران:** بۆمبا دارژاندن ف بُمباران.
**بۆمباهاوێژ:** فڕۆکەی بۆمبا هەڵگر، فڕۆکەی بۆمباران دەکا ف بُمب‌افکن.
**بۆمچ:** بۆنی شەداری، بۆگنخ ف بوی نا.
**بۆمچك:** بۆمچ ف بوی نا.
**بۆمچە:** بۆمچ ف بوی نا.
**بۆمچەو:** بۆمچ ف بوی نا.
**بۆمچەوە:** بۆمچ ف بوی نا.
**بُومەلەرزە:** زەلزەلە، بولەرزە ف زلزلە.
**بُومەلێڵ:** ۱) شەوەکی، هەوەڵ بەرەبەیان؛ ۲) پاش نوێژی شێوان، بوُلێڵە ف ۱) نگا: بوُلێڵە؛ ۲) بعد از غروب.
**بۆن:** ۱) بێهن، بڕوانەبوّ؛ ۲) حەتر، عەتر؛ ۳) بۆئێمە ف ۱) نگاه کن؛ ۲) عطر؛ ۳) برای ما.
**بوُن:** ۱) بەرانبەری نەبون، بەرچاوو زیندو، وجود؛ ۲) دارایی ف ۱) بودن؛ ۲) دارایی.
**بۆنبڕ:** بۆچنە ف بوگیر.
**بۆنبڕە:** دەرمانی نەخۆشی لەبەربۆن ف داروی مرض بوزدگی.
**بۆن پێدان:** بۆدانی دانەوێڵە لەسەر ساج ف بودادن دانە.
**بۆن پێوە کردن:** ۱) بۆنی خۆش بەلوت هەڵمژین؛ ۲) تاوکردنی مێچکە لەلایەن نێرەوە *لەناو جانەوەراندا* ف ۱) استشمام؛ ۲) تلاش گشن در جذب مادە بە جفتگیری.
**بۆنتێدان:** حەترتێ هەڵسون ف عطر مالیدن.
**بۆن تێ کەوتن:** سەرەتای پێگەیشتنی بێستانی گڕکەو گندۆرە ف آغاز رسیدن میوە در چالیز.
**بۆنخۆش:** هەرچی بۆنی پەسندی لوُتە ف خوشبو.
**بۆنخۆشکە:** ڕێحانە کێویلە، گیایەکە ف ریحان کوهی.
**بۆنخۆشکەرە:** گیایەکە وشکی دەکەن بۆناو جلکان ف گیاهی است کە آنرا خشك کنند و برای خوشبوکردن لباس از آن استفادە می‌شود.
**بۆنخۆشی:** بۆنێ کەمرۆ پەسندیەتی ف خوشبویی.
**بۆندار:** خاوەنی بۆنی خوەش ف بودار.
**بۆندان:** بۆدان ف ظرف عطر.
**بۆن دانەوە:** بۆن بڵاو کردنەوەی گوڵیا... ف بوی پراکندن.
**بۆندڕ:** بۆدڕن ف بوی زیر بغل و ماهی.
**بۆن کردن:** ۱) بیهن کرن؛ ۲) سۆراغ کردن بەخەیاڵ دۆزینەوە ف ۱) بوییدن؛ ۲) سرنخ گرفتن.
**بۆنـگ:** هەڵاڵـدان، خۆش کردنی پێست بۆ مەشکە ف دبّاغی پوست برای مشك.
**بۆنو بەرام:** بۆنی خۆشی بڵاوەبو ف بوی و نَکْهَتْ.
**بۆنە:** ۱) هۆ، سەبەب، سۆنگە؛ ۲) بەهانە، بیانو ف ۱) سبب؛ ۲) بهانە.
**بونەبەرد:** رەق هەڵاتن وەك بەرد ف سخت شدن.
**بونەوە:** دوبارە پەیدابون ف دوبارە پیدا شُدن.
**بوُنەوەر:** گیاندار ف جاندار، ذیروح.
**بوە:** ۱) دارا؛ ۲) ببەرە؛ ۳) کوند، کوندەبوە؛ ۴) بمێنە؛ ۵) ببە، وەهابە؛ ۶) بیەن، ببوە ف ۱) دارا؛ ۲) بِبَر؛ ۳) بوم؛ ۴) بمان؛ ۵) باش؛ ۶) بودە است.
**بوها:** ۱) گرانقیمەت؛ ۲) بایی، نرخ، بهێ ف ۱) گرانقیمت؛ ۲) نرخ.
**بوهار:** بەهار، بوار ف بهار.
**بۆهت:** بێ‌ژن، سەڵت ف مُجرَّد.
**بوهـرین:** ۱) بزرکانی شیر؛ ۲) پیربونی گیا ف ۱) فاسدشدن شیر؛ ۲) پیرشدن گیاه.
**بوەتەقلە:** جۆرە کوندێکی مەزنە ف نوعی بوم بزرگ.
**بوەستە:** مەرۆ ف ایست.
**بوە کوێرە:** جۆرێ کوند ف بوف کور.
**بوهل:** گەڵی، دۆڵی تەنگو قوُڵ، دەرە ف درّە.
**بوهوست:** بست، بنگس ف وجب.
**بوهیشت:** بەحەشت، بەهەشت ف بهشت.
**بویٚ:** ببێ ف باشد.
**بۆی:** گارسۆن، شاگرد ف گارسون.
**بۆیاخ:** ڕەنگی دەرمان ف واکس.
**بۆیاغ:** بۆیاخ ف واکس.
**بۆیاغچی:** رەنگ کەر، کەوش رەشکەرەوە ف واکسی.
**بوێر:** ۱) ئازا، نەترس؛ ۲) تێپەڕ: (بابـوێر، ساڵ بوێر) ف ۱) شجـاع؛ ۲) مَنْفَذْ.
**بوێژ:** ۱) قسیەکەر؛ ۲) شایەر؛ ۳) گۆرانی‌بێژ ف ۱) گوینده؛ ۲) شاعر؛ ۳) ترانەخوان.
**بوێس:** مەڕۆ، مەچو، ڕاوەستە ف ایست، نَرو.
**بویسان:** بێستان ف پالیز.
**بوێست:** بوێس ف ایست.
**بوێسە:** بوێس، راوستە ف ایست.
**بوُیش:** ۱) زەمەندو قشلاخی بێ‌ئاو؛ ۲) بێژە، بڵێ ف ۱) عَلَفزار بی‌آب؛ ۲) بگو.
**بوُیك:** ۱) بوُك، وەوی؛ ۲) باپشکێو ف ۱) عروس؛ ۲) گُل‌مژە.
**بۆین:** ڕازی ف قانع.
**بۆینباخ:** کراوات، پارچەی مل‌پێچو شۆڕەوەبو ف کراوات.
**بۆیە:** ۱) بۆیاخ، واکس‌و رەنگی نەقاشی؛ ۲) لەبەر ئەوە، بەوهۆیە ف ۱) واکس و رنگ نقاشی؛ ۲) به‌این دلیل.
**بۆیەچی:** کەوش بۆیاخ کەر، دیواررەنگ کەر ف واکسی، نقّاش ساختمان.
**بۆیەر:** ۱) ببورە، ببەخشە؛ ۲) رابردو ف ۱) ببخش؛ ۲) گذشته.
**بۆیەکاری:** رەنگ کردنی دیواری ماڵ ف نقاشی ساختمان.
**بە:** *پیت‌و بزاوێکـە چلەدوای وشـەو چلەپێش وشـەبێ چەنـد واتایەکی جۆراوجۆر دەگەیەنێ کە هێندێکیان بەم جۆرەن :* ۱) ببە: (من‌چۆنم، تۆش وابـە)؛ ۲) بەرە: (ئـەم قەڵەمە لابە)؛ ۳) بکە: (زوبە بابڕوین)؛ ۴) سۆیند: (بەسەری تۆ)؛ ۵) هۆ: (بەمن بوی بە پیاو)؛ ۶) پەیوەندی: (کـەمن باراشـەکـەم بێ‌بارەبـەر بێ / بەمن‌چی دەشت‌و دەر پڕ نێرەکـەربێ)؛ ۷) لای: (دەفتـەر بەتـۆیە)؛ ۸) خاوەن: (بـەهـۆش،

بەجـەرگ)؛ ۹) دەگەل: (بەمنڕا وەرە)؛ ۱۰) نرخو بەها: (بەچەندت کڕیوە؟)؛ ۱۱) ئەنـدازە: (بـەقـەد تۆیە)؛ ۱۲) چۆنیەتی: (بـەکاڵی، بەپیری)؛ ۱۳) گۆڕان: (بەفرەکە بوبە ئاو، ئەو پارەوەت بەسندان بێ!)؛ ۱۴) بەر: (خەرمان بە بادان)؛ ۱۵) بۆ: (بەتۆ بڵێم، بێگانە بەدەر)؛ ۱۶) گیرۆدەیی: (بـەچـاوتـەوە کردم، بەتـەڵەوە بوم)؛ ۱۷) *بەرلە فعل بۆ ئامـرازو ئاکـارشـانـدان دێت*: (بەخۆ دەنازێ، بەڕێدا دەڕوا)؛ ۱۸) لەکاتو لاو جێدا: (بەسەرمن داهات، بەشەو دەخەوم، سەرم بەماڵدا کرد)؛ ۱۹) بێزیادو کەم: (دوبـەدو)؛ ۲۰) جوتو پێکـەوە لکیاو: (شـانبەشان)؛ ۲۱) لەپڕ: (بەسەریدا چوم)؛ ۲۲) لە: (بەجێمام)؛ ۲۳) بەرانبەر: (بەقانون قەدەغەیە)؛ ۲۴) پێوەچونوتێوەچون: (ڕێوی بەکونەوە نەدەچو، دەزوم بە دەرزی یەوە کرد) ف *واژه‌ای است که چه به‌عنوان پیشوند و چه به‌عنوان پسوند معانی مختلفی را می‌رساند که بعضی از این معانی به‌قرار زیر است*:
۱) بـاش؛ ۲) برادر؛ ۳) کُن؛ ۴) قسم؛ ۵) سبب؛ ۶) حرف ارتبـاط؛ ۷) پیش، نزدِ؛ ۸) صاحب؛ ۹) حرف هَمراهی؛ ۱۰) نرخ و بها؛ ۱۱) انـدازه؛ ۱۲) چگونگی؛ ۱۳) حرف تغییر؛ ۱۴) بر؛ ۱۵) برای؛ ۱۶) دُچارشدن؛ ۱۷) و ۱۸) ظرف زمان و مکان؛ ۱۹) بی‌کم کاست؛ ۲۰) جفت و همتا؛ ۲۱) یکباره؛ ۲۲) از؛ ۲۳) طبق؛ ۲۴) دَر.

**بەئاسپایی:** هێدی، هێدیکا، یەواش ف یواشکی.

**بەئـاستـەم:** ۱) بەحاڵ، زۆر بەسەبر؛ ۲) یەکجار زۆر کەم: (**بەئاستەم** بریندار بوە) ف ۱) خیلی آهسته؛ ۲) خیلی کم.

**بەئـاگـا:** ۱) خاوەن خەبـەر؛ ۲) نەخـەوتـو، خەولێ نەکەوتو، بێدار ف ۱) باخبر؛ ۲) بیدار.

**بەئاگاهاتن:** لەخەو هەستان، وشیاربون، بێداربونەوە ف از خواب بیدار شُدن.

**بەئاوات گەیشتن:** مراد حاسڵ‌بون، بەکاورەسین، ئارەزو پێک‌هاتن ف بەآرزو رسیدن.

**بەئـاوادان:** ۱) دەئـاو هاویشتن؛ ۲) بریەتی‌لە بەفیڕۆدان؛ ۳) دەئـاوی خاوێن هەڵکیشانی جلکی کەفاوی ف ۱) در آب انداختن؛ ۲) کنایه از حرام گردانیدن؛ ۳) آب کشیدنِ لباس.

**بەئاودادان:** بەئاوادان ف نگا: بەئاوادان.

**بەئۆك:** ناشیرنی پیاوترسێن، زەبەلاحی ناقۆڵا ف لندهور بدشکل.

**بەئەمەگ:** خاوەن وەفا، چاکە لەبیر، دژی سپڵەو پێ‌نەزان ف وفادار.

**بەئێش:** بەژان، بەئازار ف دردناك.

**بەئیش:** خەریکی کار، مژول ف مشغول.

**بەبـا:** ۱) شوێنی باگر؛ ۲) دێڵی نێرخواز، دەڵەوەبا ف ۱) جای بادگیر؛ ۲) گُشن‌خواه.

**بەبان:** منالان، منالگەل ف بچه‌ها.

**بەبڕ:** بەبڕشت، بەزاکون، کار لەدەست هاتو ف آدم کارآمد.

**بەبڕشت:** ۱) زۆر بەکارو کار لەدەست هاتو؛ ۲) زەوی بەپیتو ڕیژەو ف ۱) آدم کارآمد؛ ۲) زمینِ حاصلخیز.

**بەبك:** منالی ساوا ف نوزاد.

**بەبلانە:** بوکەڵەی منداڵ ف عروسك.

**بەبلە:** ۱) تۆل، پیزە، پز، بێچـو لەنـاو زگدا؛ ۲) ساوا، منالی چکۆلە ف ۱) جنین؛ ۲) نوزاد.

**بەبن:** ۱) ریشـەدار، بەڕەه، رەگدار؛ ۲) کیژی کون نەکـراو؛ ۳) گیای بەسەلك ف ۱) ریشەدار؛ ۲) دوشیزە؛ ۳) گیاه پیازدار.

**بەبوکە:** بوکی منداڵان، بوکەڵە، بویکا زاروکا ف عروسك.

**بەبوڵە:** بەبوکە ف عروسك.

**بەبـە:** ۱) منالی‌ساوا؛ ۲) ناوی هۆزێکی کەونارا لە شارەزور، بابان ف ۱) نوزاد؛ ۲) یکی از عشیرتهای کُرد.

**بەبـەر:** ۱) بەمیوە، بەبـەهـرە؛ ۲) کوتـاڵی بەرپان ف ۱) درخت مُثمر؛ ۲) پارچهٔ عریض.

**بەپانەوە:** ۱) بەتەواوی؛ ۲) رکو راس ف ۱) بەتمامی؛ ۲) بەصراحت.

**بەپـشـت:** ۱) پتـەو، قایم؛ ۲) خاوەن داژدارو پشتیوان ف ۱) محکم؛ ۲) نورچشمی.

**بەپشو:** لەسەرخۆ، هێمن، بەحەوسەڵە، نەفەس درێژ ف آرام و شکیبا.

**بەپێ:** قۆچـاغ، خۆشـڕۆ، بلەز لریقـەچـونێ، شاتـر، خۆشبەز ف پیادهٔ چالاك، بادپا.

**بەپێچ:** ۱) پێچدار، وەك برغـو؛ ۲) لەدەروندا وریاو فێڵباز ف ۱) دارای پیچ؛ ۲) آدمِ تودار.

**بەپیرەوەچون:** پێشوازی کردن: (سەد هەتیو خۆی تاسو لوس‌دا **چون بەپیری** شێخەوە) «شێخ رەزا» ف استقبال.

**بەپێل:** شەپۆلدار: (ئەم جاجمە **بەپێلە**، گۆمێگی **بەپێلە**) ف دارای موج، موّاج.

**بەپیلە:** تەشقەڵەباز، گڕنەگر، بەهانەگیر ف بهانەگیر.

**بەت:** مراوی ف مُرغابی.

**بەتار:** هەتەری چاو، ڕۆشنایی‌و بینایی‌چاو ف مسافتِ دید.

**بەتـارە:** فلچە، گزکچە، ئەو گەسکەی جوڵا بوزوی پێ چرێش دەدا ف فرچهٔ سریش‌زنی جولا.

**بەتـاق:** ۱) کەمـەی سەردیوارو گونبـەز، سەردەرکو گونبـەزی بەتـاق هاتوتەوە؛ ۲) تەنیا: (**بەتاقی تەنیا**)؛ ۳) ئاواڵە، ڤەکری: (پەنجەرەکەتان **بەتاق‌بو**) ف ۱) گُنبدی؛ ۲) تنها؛ ۳) گُشاده، وا.

**بەتاقە:** بلیت، پسولەی مقەبای لەسەرنوسراو ف بلیت.

**بەتاقەت:** ۱) خاوەن هێز؛ ۲) بەسەبر و حەوسەڵە ف ۱) توانا؛ ۲) شکیبا.

**بەتاقی کردنەوە:** ئەزمون، تەجرەبە کردن ف آزمودن.

**بەتـاڵ:** ۱) بێ‌ناوەرۆك، والا، خاڵی؛ ۲) نامـاقـوڵ، هەڵـوەشـاو: (نوێژم **بەتاڵە**)؛ ۳) بێکار: (برایەکم **بەتاڵە**) ف ۱) تُهی؛ ۲) باطل؛ ۳) بیکار.

**بەتاڵایی:** بۆشایی، والایی ف فراغ.

**بەتاڵ کردن:** دەس هەڵگرتن لەکار، پایدۆز: (هەرنیوەڕۆ **بەتاڵمان کرد**) ف دست از کار کشیدن.

**بەتاڵی:** پوچی، بێکاری ف بیکاری.

**بەتام:** خۆش لەزمان، خۆش چێژە ف خوش‌مزّه.

**بەتاناچون:** بەدرێژی باس کردن ف زیاد و مبسوط بحث کردن.

**بەتاناهاتن:** بەتانا چون ف نگا: بەتاناچون.

**بەتانوپۆداهاتن:** بەتاناچون ف نگا: بەتاناچون.

**بەتانە:** ئاردەمشاری بەچرێش هەڵپشیودراو کە دارتاش دەکاری دەکا ف بطانە.

**بەتانی:** پەتو، عەدیاڵ، پێخەفی چنراوی بێ بەروپشت، ئەبیاڵ ف پَتو.

**بەتانیە:** بەتانی ف پتو.

**بەتر:** پێشتر، پێشو: (بەترییر، بەترێرار، بەترییرێ) ف پیشتر.

**بەترمە:** هەڵپەرتاوتن، بڕینی لکی زیادی دار ف پیراستن، هَرَس.

**بەترومە:** بەترمە ف پیراستن، هَرَس.

**بەترەف:** ١) بەتـڵاو، خراپ؛ ٢) بەفیڕۆ، لەدەستچوگ ف ١) ضایع؛ ٢) هَدَر شُدە.

**بەتکەبەش:** چوالو، چالگ، کوڕەبەش، چالو، چالەکە ف گورکن.

**بەتڵ:** ١) پاڵەوانو ئازا؛ ٢) ماندو: (ئەز بەتڵیم گەلەکی ماندی بوم)؛ ٣) بەشێك لەشەو ف ١) قهرمان؛ ٢) خستە؛ ٣) قسمتی از شب.

**بەتڵان:** لەبەین چون، نەمان، لەکار کەوتن ف ازبین رَفتن و از کار اُفتادَن.

**بەتڵاندن:** لەبەین‌دان، خراکردن، ونداکردن ف هدردادن، گُم کَردَن.

**بەتڵانە:** وچان، رۆژی کارنەکردن، تەحتیل ف تعطیل.

**بەتڵە:** ساوار ف بلغور.

**بەتڵی:** ماندو، مانگ، خەستە، مانو ف خستە.

**بەتڵین:** ماندوبون ف خستەشدن.

**بەتو:** رەحاتی، رەحەتی، ئامرازی تراو لەدەفر کردن ف قیف.

**بەتۆکڵ:** بریەتی لە قسەی بەهیما، قسەی زیپك و پلار ف سخن تودار.

**بەتوێ:** بەیەك، بەتەنها: (**بەتوێ** کراس) ف بەتنها.

**بەتوێکڵ:** بەتۆکل ف نگا: بەتۆکل.

**بەتۆن:** چش، بەجەهەننەم ف بەدرك، بەجهنّم.

**بەتەر:** خراپتر، خراوتر ف بَدتَر.

**بەتەقەکەوتن:** شەرمەزاربوُن، تەریق بوُنەوە ف شرمندە شُدن.

**بەتەڵەب:** یەکسمی مێچکەی نێرخواز، بەفاڵ ف مادیانِ نرخواە.

**بەتەماح:** چاوچنۆك، تەما، تەماحکار ف آزمند.

**بەتەماع:** بەتەماح ف آزمند.

**بەتەنگەوەبون:** بەگرنگ گرتن، خەم خواردن بۆ کارێ یاکەسێ: (زۆر بۆمن **بەتەنگەوە** مەبە) ف اهمیّت دادن.

**بەتەوس:** بەزیپك، قسەی بەپلار، بەتێکول ف سُخنِ طعنەآمیز.

**بەتیسك:** بەخوری، تیسك درێژ ف پشمالو.

**بەتین:** بەگەرمایی‌خۆریاناگر: (ئاوری‌ژێرپۆلوان‌**بەتینە**) ف پُرحرارت.

**بەتیە:** پارچەیەکی ناسکە بۆ عەبای هاوینە ف نوعی پارچە نازك و تنک برای عبای تابستانی.

**بەجا:** جێدار، قسە یان کاری ئەقڵ پەسند، بەجێ ف بجا، روا.

**بەجگە:** بل، بەغەیرەز، جیالە ف بجُز.

**بەجوج:** ١) چەنـەباز، قسەدرێژ، زۆربڵێ، چەنەوەر، هەڵەوەڕ، چەقەسرۆ؛ ٢) دامێن تەڕ، داوێن پیس ف ١) ژاژخا، ورّاج؛ ٢) تَردامن.

**بەجەڕ:** بزماری بەپێچ ف میخ‌پیچ.

**بەجەرگ:** ئازا، رەشید، گەڕناس، زیخ، جامێر، نەترس، بوێر، بە غیرەت، دلێر ف شجاع و بیباك.

**بەجێ:** ١) بەجـا؛ ٢) لەجێگە؛ ٣) زو: (جێ **بەجێ** هاتم) ف ١) بجا؛ ٢) بجای؛ ٣) سریع.

**بەجێمـــان:** لەدوا مانـەوە، لەوەختی خۆدا پی نەگەیشتن: (بــە**جێ‌ماوم** لەیاران، نابـەجێ ماوم ئەجـەل زوبـە / بەمـردن لەم قسـوری ژینـە ئیستیعفا نەکەم چبکەم) «مەحوی» ف عقب ماندن، واماندن.

**بەجێ‌ماو:** دواکەوتو ف واماندە.

**بەجێ هاتن:** کار دروست‌بون، کار پێك‌هاتن، کران ف انجام شدنِ کار.

**بەجێ هانین:** پێك‌هێنان، دروست کردنی کار، کردن ف انجام دادن.

**بەجێ هێشتن:** خستنەدواوە، جێ‌هێشتن، وەدوادان ف بجای گذاشتن.

**بەجێ هێنان:** بەجێ‌هانین ف بجای آوردن.

**بەچ:** ١) بێچو، بەچکە، بەچك، زا؛ ٢) پورەی هەنگ، شڵخەمێش ف ١) بچّە؛ ٢) نسلِ نوینِ زنبورِ عَسَل.

**بەچاوکردن:** دیتن، دین، هاتنەبەرچاو ف دیدزَدَن.

**بەچاوەبون:** چاوزار کارلێکردن ف چشم زخم خوردن.

**بەچاوەوەبون:** بەچاوەبون ف چشم زخم خوردن.

**بەچـــك:** ١) تەرح، بیچم، کەسم، شکـڵ، سەکـوت؛ ٢) منـداڵ، زارۆ، زاورۆ، بێچو؛ ٣) بان مەلاشو، بەشەسەری هاوسای توێڵ ف ١) طرح، قیافە؛ ٢) کودك؛ ٣) چکاد، بالای پیشانی.

**بەچکە:** بێچو، بەچکە باڵدار، جوچکە ف جوجۀ پرندە.

**بەچگ:** بان‌مەلاشو ف چکاد.

**بەچنگ:** ١) خاوەن چنجروك؛ ٢) خێراو ئازا لە پەیدا کردن ف ١) دارای چنگال؛ ٢) زرنگ.

**بەچو:** بێچو ف بچّە.

**بەچوڵە:** بێچوی تازەهاتو، تازەزاو، ساوا ف نوزاد.

**بەچوە:** بێچو ف بچّە.

**بەچە:** ١) مناڵ؛ ٢) بریەتی لە بوُك، لە زاوا؛ ٣) مناڵی حیز، لوسکە ف ١) کودك؛ ٢) کنایە از عروس یا داماد؛ ٣) اَمْرَد.

**بەچەباز:** مناڵباز، هەتیو باز، کورگێ ف بَچەباز، غُلام‌بارە.

**بەچەخۆرە:** نەخۆشی تێرنەخواردن ف بیماری سیرنشدن.

**بەچەدان:** پزدان، مناڵدان، زێدان ف زهدان.

**بەچەك:** چەکدار، ئامرازی جەنگ پێوە ف مُسلّح.

**بەح:** وشەی سەیرمان: (**بەح** لەوکارە تۆدەیکەی) ف حَرف تعجب.

**بەحاستەم:** بەئاستەم ف بەسختی.

**بەحر:** ١) زەریا، دەلیا؛ ٢) بەش، پار ف ١) دریا؛ ٢) سهم و قسمت.

**بەحس:** لێدوان، باس ف بحث.

**بەحەشت:** بەهەشت، بوهیشت، جەنەت ف بهشت.

**بەحەیا:** شەرمن، فهێت‌کار، شەرمین ف محجوب، باحیا.

**بەخ:** پەخە، ئای چەند جوانە! ف بەبە.

**بەخـاوەن کردن:** ١) ئاگالێ‌بون؛ ٢) دانـەوەی گوم‌بوُ بەخاوەنی ف ١)

نگهداری کردن؛ ٢) رد نمودن گم شده به صاحبش.

**بەخت:** ١) ئیغبـاڵ، سعـود؛ ٢) پەیمـان و بەقـا: (عـەرەب بێ‌بەختن سۆزی‌خۆ نابـەنـەسـەر)؛ ٣) پەنـا، داڵـدە: (ئـەزدێمـە **بەختێ**‌تە)؛ ٤) خەرج، مەسرەف: (ئەوماڵەی هەمو **بەخت** کرد) ف ١) شانس؛ ٢) پیمان؛ ٣) پناه؛ ٤) خرج.

**بەختان:** توش‌بونی نەهات: (خوشکم چبکەم ئەوەش لە **بەختانمە**) ف بدشانسی.

**بەختدار:** بەئیغباڵ، بەسعود ف خوشبخت.

**بەختڕەش:** بەدبەخت‌و نەگبەت، چارەڕەش ف سیەبخت.

**بەختکردن:** خەرج کردن ف خرج کردن.

**بەختە:** ١) پەروار، دابەستە؛ ٢) بەران، نێری ف ١) پرواری؛ ٢) قوچ.

**بەختەباران:** بەختەڵباران، بارانەی گوڵەدەغڵ قەڵەو کردن ف باران در خردادماه.

**بەختەکی:** بەهەڵکەوت، خۆوبەختی ف تصادفی، اتّفاقی.

**بەختەڵباران:** بەختەباران ف نگا: بەختەباران.

**بەختەمام:** پیاوی راست‌و قسەپتەو ف آدمِ راست و دُرُست.

**بەختەمامی:** راستی‌و قسەپتەوی ف راستی و دُرُستی.

**بەختەوار:** بەویژدان‌و راست ف باوجدان و دُرُستکار.

**بەختەوەر:** خاوەن ئیغباڵ، بەبەخت ف خوشبخت.

**بەختیار:** بەختەوەر ف بختیار.

**بەختـیاری:** ١) کامـڕەوایی، خاوەن بەختـی؛ ٢) تیرەیەکی گەورە لەکوردی لوڕ ف ١) کامرانی؛ ٢) یکی از تیره‌های بزرگ کُردِ لُرستان.

**بەخـزمەت:** ١) قەدرگری میوان؛ ٢) ژێردەستی ئازاو گوێ‌لەمشت ف ١) مهمان‌دوست؛ ٢) نوکرِ خوب.

**بەخشـان:** بڵاوکردن، پرژاندن: (ماڵەکەی تەخشان‌و **بەخشان** کرد) ف منتشر کردن و پراکندن.

**بەخشایشت:** عافو، بوردن لەتاوان ف بخشایش.

**بەخشش:** خەڵات، بەخۆشی‌و خۆڕایی خەڵات‌بادراودان ف اَنعام دادن.

**بەخشندە:** دڵاوا، سەغی، بەدڵ ف سَخی.

**بەخشیش:** بەخشش، ئەنحام ف بخشش.

**بەخشین:** ١) دانی بێ‌قەرەبـو؛ ٢) عافـوکردن، لێ‌بوردن ف ١) کمك مادی بلاعوض؛ ٢) عَفوکردن.

**بەخشینەوە:** دابەش کردن ف توزیع.

**بەخۆداهاتن:** گەشەکردن، هەڵدان ف شکوفاشُدن.

**بەخوری:** مەڕی تیسکن ف گوسفند پشمو.

**بەخۆژیو:** خۆژی، کەسێ کە کاری بەیاریدانی ئەموئەونیە ف متکی بخود.

**بەخـۆفشین:** خۆ بەزیاد زانین، لەخـۆ بایی‌بون: (چـاوچاو ئەو هەتیوە **بەخۆی دەفشێ**) ف تَکبُّر، بەخود نازیدن.

**بەخۆکردن:** سەرپەرشتی کردن، بەخودان کرن، حاواندنەوە، بەخێوکردن ف پروراندن، سرپرستی کردن.

**بەخۆنازین:** خۆهەڵکێشان ف بەخود نازیدن.

**بەخۆوە:** مرۆی ئەستورو تێکسمڕاو ف مردِ چاق و تنومند.

**بەخۆوەبەستن:** دەگەڵ خۆ خستن ف همراه خود ساختن.

**بەخوێ کردن:** بەخۆ کردن ف نگا: بەخۆ کردن.

**بەخەبەر:** نەخەوتو، بەئاگا ف بیدار.

**بەخەڵ:** باخەڵ ف بغل.

**بەخەڵ‌فرۆش:** دەس فرۆش، چەرچی ناو بازار ف دستفروش، پیلەور.

**بەخەمکردن:** بەخۆ کردن ف نگهداری کردن.

**بەخی:** شلوێ، لێڵاو: (ئاڤا **بەخی** ئەزڤە ناخوم) ف آب گل آلود.

**بەخێر:** بەهرەوەر، بەقازانج: (دەستت زۆر **بەخێرە**) ف بابرکت.

**بەخێراتن:** خێرهێنان، بەخێرهێنان، خۆشهاتن ف خوش‌آمد.

**بەخیرەت:** ١) ئازا، نەترس؛ ٢) خاوەن ناموس‌و پیاوەتی ف ١) شُجاع؛ ٢) غیرتمند و باناموس و شرف.

**بەخێرهێنان:** بەخێراتن ف خوش‌آمدگوئی.

**بەخیل:** ١) رژد، چروك، دەس‌قوچـاو، ڕەزیل؛ ٢) بەئێرەیی، حەسـود، بەغیل ف ١) خسیس؛ ٢) حسود.

**بەخێڵ:** بەخیل ف نگا: بەخیل.

**بەخێـو:** ئاگاداری، سەرپەرشتـی، حاوانـەوە، حەوانـەوە، ئیـوەت ف سرپرستی.

**بەخێوکردن:** بەخۆ کردن، پەروەردە کردن ف سرپرستی کردن، پروردن.

**بەد:** ١) خراپ: (کـارێ **بەدت** کرد)؛ ٢) هارولاسار: (هەتیوێکی **بەدە** قسەی بەگوێداناچێ)؛ ٣) بێ: (**بەد**فەڕە، **بەد**ئەمەگە، **بەد**بەختە)؛ ٤) شوم، نەحس: (پێو قەدەمێکی **بەدی** هەیە) ف بَد در مقابل خوب؛ ٢) بازیگوش؛ ٣) بی...؛ ٤) شوم.

**بەداخ:** دڵ بەخەم، خەمگین ف داغدار.

**بەداخەوە:** حەیفێ، مخابن، حەیف‌و خەساری ف متأسفانە.

**بەدئەدا:** بلح، جلف، سوك‌و چروك، ئاکار ناپەسەند ف هرزە و بدکار.

**بەدبەخت:** بەوبەخت ف بدبخت.

**بەدانکـەوتن:** نەخـۆشی ماڵات لە فرەخواردنی دانە جۆ یان گەنم ف مرضی کە دام بر اثر پرخوری غلە دُچار شود.

**بەدایی:** ناڵەی نەخۆش، کروزانەوەی نەساخ ف آە و نالۀ بیمار.

**بەدبین:** ناهومێد ف بدبین و مأیوس.

**بەدچارە:** خوێنتاڵ، ئێسك قورس ف بدقیافە و نامحبوب.

**بەدحەمەل:** نەگونجاو، ئاکار ناپەسەند ف زشت‌کردار.

**بەدخو:** نەگونجاو، بێ‌ئاکار ف بدخو.

**بەدخوا:** دڵپیس، لەچاکە بەدور ف بدخواه.

**بەددڵ:** بەدخوا ف بَددل.

**بەدڕا:** بیرخراپ، هزرپیس ف بدنهاد.

**بەدڕەسەن:** ناجسن، نانەجیب ف نانجیب، بداصل.

**بەدڕەفتار:** ئاکار خراپ، بەدخو ف بدرفتار.

**بەدرەقە:** بەڕێ کردن، ئاگاداری ڕێونگ لە سەفەردا. *ئەم‌وشە لەرەسەندا «پادراهە»یە، واتا: پاسداری ڕێگە. عارەب بەودەردەی بردوە* ف بدرقە.

**بەدرەمـە:** شەمەترێلکە، مێشێکی درێژوکەی رەشی *باریکتر لەهەنگە. شانـە بەدرکـانـەوە هەڵ دەبـەستێ. هەنگـوینی لەهەنگوینی هەنگ باشترە*: (هێندە شیرینە ئێژی هەنگوینی **بەدرەمەس**) ف نوعی زنبور عسل سیاه.

**بەدزوان:** زمانپیس، بەدبێژ، جنێوفرۆش ف بدزبان.

**بەدزەڕە:** بەدچارە ف نگا: «بەدچارە».

**بەدسەکوت:** بەدچارە ف نگا: بەدچارە.

**بەدشکڵ:** بەدچارە ف نگا: بەدچارە.

**بەدعەمەل:** بەدحەمەل ف بدکار.

**بەدعەمەڵ:** بەدحەمەل ف بدکار.

**بەدقەوارە:** بەدچارە، زەبەلاحی ناقۆڵا ف بدقوارە.

**بەدقەول:** پەیمانشکێن، بێبەخت ف بدقول، پیمانشکن.

**بەدکار:** ١) پیاوخراپ؛ ٢) شوفار، تێچێن، شەیتانی کەر ف ١) بدکار؛ ٢) جاسوس، نمّام.

**بەدکردار:** بەدخو ف بدکردار.

**بەدگۆ:** بەدزوان ف بدگو.

**بەدڵ:** ١) بەڕاست، لەتەهی دڵەوە؛ ٢) دڵاوا، بەخشندە ف ١) از تهِ دل؛ ٢) بخشندە.

**بەدڵبوُن:** پەسندکردن، بەدڵ ف پسندیدن.

**بەدلغاو:** ئەسپو ماینی سەر رەق، لغاو قبوڵنەکەر ف بدلگام.

**بەدڵەوەچەسپان:** پەسند، پەسندکردن ف پسندیدن.

**بەدڵەوەچەسپین:** بەدڵەوەچەسپان ف پسندیدن.

**بەدمەست:** مەستی کەلەلا، زۆر سەرخۆش ف بدمَست.

**بەدمەستی:** شەڕو هەرای مەستانە، عەربەدە ف بدمستی.

**بەدنام:** بەدناو ف بدنام.

**بەدنمەك:** بێوەفا، پێنەزان، سپڵە ف نمكنشناس.

**بەدنێو:** بەدناو ف بدنام.

**بەدنیهاد:** دڵچەپەڵ، دڵپیس، بەدخوا ف بدنهاد.

**بەدواچ:** زمانپیس ف بدزبان.

**بەدواز:** بەدفەڕ، ئەوەی خراپەی خەڵکی دەوێ ف بدخواه.

**بەدۆدم:** قۆشە، شوم ف نحس، شوم.

**بەدوم:** بەدۆدم ف شوم، نحس.

**بەدوێژ:** بەدزوان ف بدزبان.

**بەدەر:** ١) جگە، بێجگە؛ ٢) بۆدەرەوە: (بێگانە **بەدەر**) ف ١) جز؛ ٢) بیرون.

**بەدەردخواردن:** بکێرهاتن، بەکارهاتن ف بەدردخوردن.

**بەدەری:** دورە پەرێزی ف انزوا.

**بەدەس:** ١) بەدەسەڵات، دەسڕۆیشتوُ؛ ٢) چابكو کارامە ف ١) بانفوذ و قدرت؛ ٢) چابك و کارا.

**بەدەست:** بەدەس ف نگا: بەدەس.

**بەدەستگرتن:** کچێنی بردنی بوك، دەگەڵ بوك نوستن بۆهەوەڵجار ف با عروس همخوابە شدن.

**بەدەستەڵات:** دەسڕۆیشتو ف بانفوذ.

**بەدەستەواو:** ١) بەهاوکاری؛ ٢) بەئامانەت دانی بۆ ئامانەت وەرگرتن ف ١) با همکاری؛ ٢) کار متقابل.

**بەدەستەوە:** حازرو ئامادە ف آمادە.

**بەدەستەوەدان:** تەسمیل کردن، تەسلیمکرن، دانەدەست ف تسلیم کردن.

**بەدەسگرتن:** بەدەستگرتن ف برداشتنِ بکارت عروس.

**بەدەسەڵات:** بەدەستەڵات ف بانفوذ.

**بەدەسەوە:** بەدەستەوە ف آمادە.

**بەدەق:** ١) شەقو تورتو لەگەشـە؛ ٢) کوتـاڵی کەتیراوی؛ ٣) ساخو بەدەماخ ف ١) تُرد و شاداب؛ ٢) پارچهٔ آهارزدە؛ ٣) سلامت و شادمان.

**بەدەڵ:** ناجسن، لەبات عەسڵ ف بَدَل.

**بەدەم:** ١) بەلەزخۆر، زۆر لەوەڕ؛ ٢) دەم هەراش و قسەزان ف ١) کسی کە در خوردن عجلە کند؛ ٢) سخندان و ورّاج.

**بەدەمار:** ١) بەغیرەت، بەحوزم، مێرخاس؛ ٢) بەفیزو لەخۆبایی ف ١) باغیرت؛ ٢) مُتکَبّر.

**بەدەمو پل:** بەدەم ف فصیح.

**بەدەمودو:** خۆش ڕاوێژ، قسەرەنگین ف سخندان.

**بەدەن:** ١) لەش، قەلب، قالب؛ ٢) دیواری بەرزی حەوش ف ١) تن؛ ٢) دیوارِ بُلند.

**بەدەو:** ١) جوان چاك، خوشیك، لاو، خوشکـۆك، زێبـا، شیرین؛ ٢) ئەسپی خۆشبەز ف ١) زیبا؛ ٢) اسب خوشرو.

**بەدیارەوەبون:** ئاگاداری کردن، پاسداری کردن ف نگهداری کردن.

**بەدێلڤانی:** دەستەواو ف کار متقابل.

**بەدی:** ١) دیتن، دین: (لەدورەوە **بەدیم** کردی)؛ ٢) بەگومانو مەزەننە: (بەخەیاڵ شوێنێکم **بەدی** کردوە)؛ ٣) بەرێ، ئارێ: (نەچوی؟ **بەدی** چوم)؛ ٤) تۆخراپی؛ ٥) خراپە: (تۆ **بەدی**، ئێتر **بەدی** مەکە) ف ١) دیدن؛ ٢) بەگمان؛ ٣) آری؛ ٤) بدهستی؛ ٥) بد بودن.

**بەدیل:** نۆرە، نۆبە، نۆگە، سەرە، سرە ف نوبت.

**بەدین:** ١) موسوڵمانی چاك، دیندار، لەخواترس؛ ٢) ئێمە خراپین ف ١) متدیّن؛ ٢) ما بد هستیم.

**بەڕ:** ١) زرعاتی تینو؛ ٢) بەڕە، گڵێم، پەڵاس، لەی؛ ٣) بەژ، وشکانی ف ١) کشتزار تشنە؛ ٢) گلیم؛ ٣) خُشکی.

**بەر:** ١) سنـگو بەرۆك؛ ٢) میوەی دارو بێستـان؛ ٣) تۆل، پز: (بزنەکە بەری هاویشت)؛ ٤) ژێر، خوارو: (لـەبەر ماڵانەوە هات)؛ ٥) پێشو پێشتر: (**بەر** لەمن چو، لە**بەر**منەوە بو)؛ ٦) پۆشین، لەخۆکردن: (کەوام دە**بەر**دا بو)؛ ٧) لا، تەرەف، رەخ: (ئەو**بەر** موڵکی منە، ئەم**بەرە** زەوی خاڵمـە)؛ ٨) رادەو ئەنـدازەی بارست: (ئـەم کوتـاڵە **بەری** تەسکە، **بەر**پـان نیە، بەڵام **بەری** ئەستـورە)؛ ٩) بەرد، کوچـك، تەوەن؛ ١٠) گولـلەی چەکی ئاگرین؛ ١١) پیلی وشکی چرادەستیو رادیو؛ ١٢) ئاسەڕ: (کەواکەت **بەری** هەیە یان بێ**بەرە**؟)؛ ١٣) دەرگا، دەری؛ ١٤)

بەرهەڵداو ئازاد: (لەزیندان **بەر** بوم، ئەسپەکە **بەر** بوە)؛ ١٥) پاشگری هەڵگر، کێش: (رنجبەر، بارەبەر، فەرمانبەر)؛ ١٦) وەرگر: (میراتبەر، سێیەك بەر)؛ ١٧) روی تماشا: (ئەم **بەر**ێ خۆ دایە دا)؛ ١٨) بەهرەو داهات: (بەرو بۆت ئەمساڵ چۆن بو؟)؛ ١٩) بەرگەدە: (وتی توکەبەر ونکا دەنکەجۆ) «هەژار»؛ ٢٠) رو: (**بەر** بەسابلاخ دەچم)؛ ٢١) بۆری سەرپیت؛ ٢٢) بەش، پار. (ئەمەندەم بەرناکەوێ) ف ١) سینه و بر؛ ٢) میوه، ثَمر؛ ٣) جنین؛ ٤) پائین؛ ٥) قبل؛ ٦) پوشیدن؛ ٧) طرف، سو؛ ٨) عرض و پهنا؛ ٩) سنگ؛ ١٠) فشنگ؛ ١١) باطری؛ ١٢) آستر؛ ١٣) درگاه؛ ١٤) آزاد، یله؛ ١٥) پسوند بەمعنی کِشنده؛ ١٦) گیرنده؛ ١٧) روی و جهت؛ ١٨) بهره و درآمد؛ ١٩) زهار؛ ٢٠) بەطرف؛ ٢١) ضمّه؛ ٢٢) سهم.

**بەرئامای:** دەرکەوتن، هاتنەدەر ف بیرون آمدن.

**بەرئیڵ:** زەوین وەختی کێڵان ف زمین شُخمی.

**بەڕا:** ١) زاناو بەتەگبیر؛ ٢) بەرخ، وەرە؛ ٣) بەڕاستی ف ١) مدبّر؛ ٢) برّه؛ ٣) براستی.

**بەرابەر:** هەمبەر، وەکەهەڤ، چونیەك ف مساوی و برابر.

**بەرات:** ١) مزی وەرزی رەنجبەر؛ ٢) جیرەی هەمیشەیی؛ ٣) رسق و رۆزی بەش کردن: (نیوەی مانگی شابانێ شەوی جێژنی **بەراتێ** / لەخودای دەکەم تەڵەبێ بەشکو چاوجوانێم داتێ) «فولکلۆر»؛ ٤) حەواڵەی پوڵی ف ١) مُزد؛ ٢) مقرّری؛ ٣) تقسیم روزی؛ ٤) حوالهٔ پولی.

**بەراتخۆر:** فەرمانبەری بەمز، کارکەری دەوڵەت یان خان ف مُزدبگیر.

**بەراتە:** لاشی تۆپیوی فڕێ دراو ف لاشهٔ مُردار.

**بەراتی:** جیرەی دایمی ف مستمرّی.

**بەرادان:** لێڕوانین، تواشاکردن، تەماشاکردن، لێ نوڕین، بڕوانە بەر ف نگاه کردن.

**بەڕادان‌دان:** ڕاسپاردن بۆ دروست کردن: (دەستێك جلکم **بەڕادان** داوە) ف سفارش دادن.

**بەراردەی:** هەڵکەندن، کۆڵین ف درآوردن.

**بەراز:** ١) خو، خوگ، گاکوڵ؛ ٢) بریەتیە لە پیاوی زۆرهارو کۆڵنەدەرو بەکار ف ١) گراز؛ ٢) کنایه از آدمِ شجاع و نستوه.

**بەرازخۆر:** بریەتی لەکاکەیی، ئەهلی حەق ف کنایه از اهلِ حق.

**بەرازە:** ١) کەڵپی یەکسم کە لە شەش ساڵیا دێت؛ ٢) دارێ کە بەرداشی پێ بەرز دەکەنەوە؛ ٣) ملغە، لۆسە، باری؛ ٤) کاریتە؛ ٥) قایشی جوت لە شوڵی بادراو ف ١) نابِ اسب شش ساله؛ ٢) چوب حمل سنگ آسیاب؛ ٣) اهرُم؛ ٤) بالار؛ ٥) بند خیش که از ترکه بافته شده باشد.

**بەڕاس:** ١) وشەی پرسیار. واتا: بێ درۆ؟؛ ٢) لەڕاستی‌دا، بەدروستی ف ١) براستی؟؛ ٢) بەدُرستی.

**بەڕاستی:** بەڕاس ف نگا: بەڕاس.

**بەراش:** بەرداش، سەنگ ئاساو ف سنگ آسیاب.

**بەراف:** ١) بەردە زورەی تیخ تیژکردن؛ ٢) شیو وکوڵ؛ ٣) زەمینی بەراو ف ١) سنگ سوهانی؛ ٢) رخت‌شویی؛ ٣) زمین آبی.

**بەراقی:** کۆڕ، کۆبونەوە، جوات، جڤات ف اجتماع.

**بەراقێرك:** دیاری جێژنە ف کادوی عیدی.

**بەراقیك:** سوێنکە سابون ف تەماندهٔ صابون.

**بەڕاك:** هەیوان، بەربێلایی، سەکوێ سەر داپۆشراو ف تراس.

**بەرام:** بۆنی خۆش، بەرامە ف نَکهَت، بوی خوش.

**بەرامبەر:** بەرابەر ف برابر.

**بەرامبەرکێ:** ١) پێك گرتن و بەبەریەك هەڵکێشان؛ ٢) ملەو کی بەرکێ، رك بەرکێ ف ١) مقابله؛ ٢) مسابقه.

**بەرامبەری:** ١) بەرابەری؛ ٢) بەگژداچون و لەڕودا وێستان ف ١) برابری؛ ٢) مقابلهٔ جنگی.

**بەرامە:** بەرام ف نکهَت.

**بەران:** ١) پەزی نێر، نێرەمەڕ، قۆچ؛ ٢) ئامرازێکەلە هەوجاڕدا ف ١) قوچ؛ ٢) ابزاری درخیش.

**بەرانبەر:** بەرابەر ف برابر.

**بەرانبەری:** بەرامبەری ف برابری.

**بەرانپێچ:** بەروانە، بەروانکە، شیردۆش سنگ و بەری پێ دادەپۆشن ف پیشبند.

**بەرانپێڵ:** بەرانپێچ ف پیشبند.

**بەرانگە:** مۆڵگەی ڕان لەدەشت ف جای آسودن رمه در دشت.

**بەرانەکێوی:** نێری مەڕەکێوی ف قوچ کوهی.

**بەڕانی:** بیانی. بێگانە، لاوەکی ف بیگانه.

**بەرانێ:** قامکەگەورە، تلیامەزن ف انگشت شست.

**بەراو:** ١) زەمینی ئاوی، بەرانبەری دێم؛ ٢) بریەتی لە جێ جوێن و چەقاوەسو: (بابی خۆی **بەراو** کردوە، تازە **بەراو**بوە گوێ ناداتێ) ف ١) زمین آبی؛ ٢) کنایه از آدمِ فحش‌خور.

**بەراوپشت:** بەراوەژو، واژی، سەرنخون، بەرەواژی ف واژگون.

**بەراودان:** پێش‌گرتنی ئاو ف جلوآب گرفتن در آبیاری.

**بەراورد:** ١) لێکدانەوە، تاقی کردنەوە؛ ٢) تەخمین، بەخەیاڵ هەڵسەنگاندن، نرخاندن ف ١) آزمودن؛ ٢) حدس و تخمین.

**بەراوەژو:** بەراوپشت ف وارونه.

**بەراوەژی:** بەراوپشت، واژی، سەرنخون ف وارونه.

**بەراوی:** دەغڵی بەراو، ئاوی، بەرانبەری دێمی ف زمین آبی.

**بەراویتن:** بێچو بەمردویی هێنان ف سقط جنین.

**بەراویتە:** دایکێ کە بێچوی بەمردویی بوە، بێچوی نەکامڵ فڕێداوە ف مادر سقط کرده.

**بەراهی:** پێشایی ئاو یا لەشکر و... ف پیشاهنگ.

**بەرایی:** ١) بەراهی؛ ٢) ئیجازە، رەوادیتن: (دڵم **بەرایی** نادا ئازاری بدەن)؛ ٣) سەبوری، ئۆقرە: (دڵم **بەرایی** نایە) ف ١) پیشاهنگ؛ ٢) روا دیدن؛ ٣) صبوری.

**بەربا:** ١) خۆیان لەکاتی هەڵاویشتنا؛ ٢) هیچ بەسەر هیچەوە نەماو: (کەس نازانێ چۆنە؟ بەربایە!)؛ ٣) دەنکی پوچ کە لەبە باکردندا با دەیبا ف ١) خرمن زیر باد دادن؛ ٢) بر باد رفته؛ ٣) دانهٔ پوك که باد

می برد.

**بەرباد:** بێ‌زەلەت، لە کەڵك‌و کارکەوتو، هیچ پێوە نەماو ف بر باد.

**بەرباد کردن:** لەکەڵك خستن، لەبەین بردن ف ازبین بُردن.

**بەربـار:** ١) یەکسمی سێ‌ساڵـە، ساڵی گرتن‌و بارکـردنی بارەبـەر؛ ٢) بریەتی لە گوێ لەمست‌و فەرمانبەر؛ ٣) رام، ئارام: (جاران هار بو ئێستا بەربار بوە) ف ١) ستور سەساله؛ ٢) فرمانبر و مطیع؛ ٣) رام.

**بەربازن:** دەستەوانەیێك کەناهێڵێ بازن هەڵخلیسکێ‌و خلەخل بکا ف النگوگیر.

**بەربالاف:** فوتەو خاولی گەرماو ف لُنگ و فوتهٔ حمّام.

**بەربانگ:** ١) ڕۆژو کردنەوە؛ ٢) بەیانی زو، شەوەکی؛ ٣) سەرەتای شەو ف ١) وقت افطار؛ ٢) صُبح زود؛ ٣) اوّل شب.

**بەربڕ:** نەقار، بەردتاش، سەنگ‌تراش، کەڤرتراش ف سنگتراش.

**بەربژار:** هەڵبژاردە، بژاردە، مونتاز ف برگزیده.

**بەربـو:** بوکنی، ئەوانـەی بۆ بوك گوێستنەوە دەچن ف ینگه، کسانی که عروس را همراهی می کنند.

**بەربـوارد:** بەردیل کەساڵێ ئاوس بوُنی بواردبێ ف حیوانی که یکسال آبستن نشده باشد.

**بەربواردو:** بەربوارد ف نگا: بەربوارد.

**بەربوُدی:** بەربوُك، ژنێ کەدەگەڵ بوك دەچێ ف ینگه.

**بەربوُرە:** ١) بەربیر، بەخەیاڵ‌و گومان؛ ٢) بەربوارد ف ١) بەگمان؛ ٢) نگا: بەربوارد.

**بەربوُری:** پێش‌بینی، خەبەردان لەڕونەداو ف پیشبینی.

**بەربۆسە:** نێوانی نیر و بۆسە ف از ابزار خیش.

**بەربۆق:** گۆنجە، نۆێن، جۆی ئاوی داپۆشراو، بە وشتر گەڵو کێشراو ف مجرای آب سرپوشیده.

**بەربوُك:** بەربوُدی ف ینگه.

**بەربوگ:** ١) بێ ئاکار، بەدخو؛ ٢) بەرەڵا ف ١) بداخلاق؛ ٢) رها، یله.

**بەربـوُن:** ١) ئازادبـوُن لەزیندان؛ ٢) بەرهەڵدابون، بێ‌خاوەن؛ ٣) ئاو لەگۆڵـەوە دەرچـون ف ١) آزادشدن؛ ٢) بی صاحب، یله؛ ٣) خارج شدن آب از مجرایش.

**بەربوُنەوە:** داکەوتن، کەوتنەخوار، شۆڕبوُنەوە ف اُفتادن.

**بەربوُیك:** بەربوُدی، بەربوك ف ینگه.

**بەربەتاك:** ئاواڵە، وەکری ف باز، گشاده.

**بەربەخت:** کیژی عازەوی وەختی شو هاتو ف دختر عَزب.

**بەربەر:** سەرتاش، دەللاك ف سلمانی.

**بەربـەران:** پەزی سێ بەهـار دیتی، بەردیل، مەڕی سێ‌بەهـار دیتو ف گوسفند سەساله.

**بەربەرۆچك:** جێگەی خۆ هەڵخستن لەبەر تاو، روبەڕۆژ ف جای رو بەآفتاب.

**بەربەڕۆچکە:** بەربەرۆچك ف آفتابگیر.

**بەربەروشك:** سەرپێرێژن، تەمەڵی بێکارەی کە لەماڵ دەرناچێ ف تنبل و بیکاره.

**بەربـەرە:** ١) خێشـك، ئەودارە ئەستـوُرەی دەجـوُتی دەخـەن‌و شۆی پێ‌راسـت دەکـەن؛ ٢) وەروەرە، شەپـالـوخ، شاپـەڵۆخ، پاڕوی پانی بەفرماڵین ف ١) مالهٔ زمین صاف کن؛ ٢) پاروی بزرگ برف‌روبی.

**بەربـەرەکـانێ:** ١) لەروداوێستـان، دەگژراچون؛ ٢) ملەوکێ بەرکێ، رکەبەری ف ١) رودر رو ایستادن؛ ٢) مسابقه.

**بەربـەژن:** دوعـاو حەمایەڵێ کە دەملی دەکەن‌و دەچێتە سەرکەلەکە ف تعویذی که بر گردن آویزند.

**بەربەس:** ١) بەربەست، لەمپەری ئاوگەڕاندنەوە؛ ٢) لەمپەری سەرڕێگە، رێ‌بەندان ف ١) سدّ؛ ٢) راه‌بند.

**بەربەست:** بەربەس ف نگا: بەربەس.

**بەربەسێڵ:** قوڕاو، چێشتی گۆشت‌و ماست ف آش گوشت و ماست.

**بەربەسێڵك:** بەربەسێڵ ف نگا: بەربەسێڵ.

**بەربەش:** دەفر و ئامرازی کانزا ف ظروف معدنی.

**بەربەفش:** جلف، بلح، خۆهەڵکێش ف آدم جلف و خودستا.

**بەربـەق:** لێوە گۆڵـەمـەرەزە، لێواری گۆلی چەڵتـوك بۆئـاو بەهەمولا گەیشتن ف جوب شالیزار.

**بەربەلەت:** سەرسوڕێن ف سرسام‌آور و خیره کننده.

**بەربەن:** ١) دار یا بەردێ کە گۆنجەی ئەستێلی پێ‌دەگرن، بەردە گۆنجە، کون‌ئاخنی ئەستێرك؛ ٢) سینـەبەند، گەردەن‌بەندی شوڕ؛ ٣) جۆرێ خورما؛ ٤) خشڵی ژێرچەنە ف ١) دهانەگیر استخر؛ ٢) گردن‌بند؛ ٣) نوعی خرما؛ ٤) زیور زیر چانه.

**بەربەیان:** تاریك‌و ڕون، شەوەکی، هەوەڵی ڕۆژێ ف بامداد، پگاه.

**بەربیك:** بەربودی، بەربوك ف ینگه.

**بەربێڵ:** داهاتی زەوی، بەروبو ف فرآوردهٔ کشاورزی.

**بەربـێلایی:** هەیوان، بەرسـەربـانی بێ‌دیواری ئەولاو ئەولا، شوێنی باران‌نەگر ف ایوان، پناهگاه موقع باریدن.

**بەربین:** بەربینگ، ستۆکڕك، بن گەروله دەرەوە ف بیخ گلو از خارج.

**بەربێن:** بەن کەڵەوە، بەندکەڵەمە ف چنبرەبند گاو.

**بەرڕبین:** پەڵپینە، پر پرە، گیایەکە ئەخورێ ف گیاهی خوراکی.

**بەربێنکە:** بەرەڵبێنە، بەرهەڵبێنە ف پیش‌بند کار.

**بەربینك:** ١) بەربین، پێسیر، ستۆکڕك، سوکر؛ ٢) بریتی لەبەهانە ف ١) بیخ گلو؛ ٢) کنایه از بهانه.

**بەرپا:** دامەزران، بەرپاکردن، سازکردن، بەرپابون، سازبون ف برپاداشتن.

**بەرپاش:** ١) پشتەورو، واژی؛ ٢) بەرەو دواوە، بەرەوپاش ف ١) وارونه؛ ٢) رو بەعقب.

**بەرپرس:** لێ‌پرسراو، مەسول، مەسئول، بەرپرسیار ف مسؤول.

**بەرپرسیار:** بەرپرس ف مسؤول.

**بەرپشتوێن:** بەرکەمبەر ف لای کمر بند.

**بەرپشتێن:** بەرپشتوێن ف لای کمر بند.

**بەرپشتێنە:** بەرپشتێن ف لای کمر بند.

**بەرپەرچ:** ١) پێچ دانەوەی بزمار؛ ٢) ڕێگە لێ بڕینەوە؛ ٣) قسەپێ بڕین

ف ۱) پرچ میخ؛ ۲) سر راه گرفتن؛ ۳) در میان سخن آمدن.

**بەرپێ:** پێخوست، بەرپا، ژێرپێدراو ف زیر پامانده.

**بەرپێچ:** ۱) واشەر، مۆرەی پێچ؛ ۲) پێش‌گری ف ۱) واشر؛ ۲) پیش‌گیری.

**بەرتاش:** ۱) بەربڕ؛ ۲) بەرگەدەتراش ف ۱) سنگ‌تراش؛ ۲) موی زهارتراش.

**بەرتاشین:** ۱) بەربڕین؛ ۲) بەرگەدە تاشین ف ۱) سنگتراشی؛ ۲) موی عانەتراشیدن.

**بەرتاو:** شوێنێ کەتاو لێ ئەدا ف جای آفتاب‌گیر.

**بەرتفك:** چەخماخی تفەنگ، مقەنەزمە ف چخماق.

**بەرتقك:** بەرەفڕکێ، کوچك هاویتن، بەردهاوێژی ف سنگ‌پرانی.

**بەرتل:** گوێچ، پارە یان‌میچ کە لەکایەدا دای‌دەکەن ف پول یا شتالنگ کە در بازی تیلە بر زمین ریزند.

**بەرتوڕ:** خوارو خێچ، کەچ‌و داهاتو ف کج‌وکولە.

**بەرتەرەف:** لەبەین‌چون، خەلاس‌بون: (کێشەکە **بەرتەرەف** بو) ف برطرف.

**بەرتەك:** بەرهێرش ف زیر یورش قرار گرفتە.

**بەرتەڵاش:** زەبەلاحی ناقۆڵای خوێنتاڵ ف لندهور بدقوارە.

**بەرتـەڵانە:** دیاری ماڵی‌بوك بۆماڵی زاوا بەر لەگواژتنەوە ف هدیهٔ خانە عروس بە خانوادهٔ داماد قبل از ازدواج.

**بەرتەنگ:** تەنگەبەر، بێ‌دەرەتان ف تنگنا.

**بەرتێشت:** قلیان قاوەڵتی، سوکەخواردنی پاش لەخەوهەستان ف ناشتا.

**بەرتێڵانە:** بەرتەڵانە ف نگا: بەرتەڵانە.

**بەرتیل:** خاوە بۆ کارێك هێنان، ریشوەت ف رشوە.

**بەرج:** خەرجی خۆڕایی‌و نایێویست ف خرج غیرلازم.

**بەرجفت:** دەرامەتی جوت‌و گا ف محصول زراعت.

**بەرجل:** بەروانکەی مناڵ ف پیشبند بچە.

**بەرجۆم:** جیکڵدانە، سیکەتۆرە، سیقەتۆرە ف ژاغر، چینەدان.

**بەرجە:** لەپێش، زوتر ف پیشتر.

**بەرجــەوەن:** ۱) دیمـەن، لەپێش چاوڕا دیار؛ ۲) بەراورد، لێکـدانـەوە، تەخمین ف ۱) منظرە؛ ۲) تخمین و حدس.

**بەرجەوەند:** بەرجەوەن ف نگا: بەرجەوەن.

**بەرجێنگ:** پێشەسەر، خشڵێکی زێڕی ژنانە کە بەسەر توێڵدا دێت ف نوعی زیور زنان کە روی پیشانی قرار می‌گیرد.

**بەرچا:** بەرتێشت ف ناشتا.

**بەرچاڤك:** چاویلکە ف عینك.

**بەرچاو:** ۱) دیمەن؛ ۲) جوان‌و لەبار؛ ۳) دیاردە ف ۱) منظرە؛ ۲) زیبا؛ ۳) پدیدە.

**بەرچاوتاریك:** ۱) ناهومێد؛ ۲) زۆر تورەو رك‌هەستاو ف ۱) ناامید؛ ۲) مأیوس و عصبانی.

**بەرچاوتەنگ:** رژد، بەخێڵ ف خسیس.

**بەرچاوتێر:** دڵاوا، سەغاوەت ف سخی و بخشندە.

**بەرچـاوكە:** قایشی ریشوداری بەرچاوی ئەسپ ف پیشانی‌بند پُرزدار اسب و...

**بەرچاوگە:** بەرجێنگ ف نگا: بەرجێنگ.

**بەرچاوە:** ۱) توێڵ‌پێچی بەریشاڵی ئەسپ، بەرچاوكە؛ ۲) ئافتاو گەردان ف ۱) نگا: بەرچاوكە؛ ۲) پیشانی‌بند دروگران.

**بەرچاویلە:** بەرچاوگە ف نگا: بەرچاوگە.

**بەرچایی:** بەرتێشت، بەرقلیان، بەرقەننە ف خوراك ناشتا.

**بەرچن:** قەرتاڵەی میوەچنی، تریان ف سبد میوەچینی.

**بەرچنۆكە:** بەرچنی چکۆڵە ف سبدك میوەچینی.

**بەرچنە:** بەرچن ف نگا: بەرچن.

**بەرچەپ:** پێچەوانە ف برخلاف.

**بەرچەق:** سەرچۆپی‌کێش، پێشەنگی گۆبەند ف پیشاهنگ رقص دستەجمعی.

**بەرچەڵە:** ئەستوندەکی دەرەوەی چادر لەلای چیغەوە ف ستون خارجی خیمە.

**بەرچـەنـە:** ۱) خشڵێکـە بەبـەر چەنەگەدا دێ‌و لەدولا لەسەر دەدرێ، کرمەك؛ ۲) بەرخەبەبە ف ۱) زیور زیرچانە؛ ۲) غبغب.

**بەرچیت:** ۱) سنگی چیغڕاگر؛ ۲) بریەتی‌لە پەیاغ، گالۆك ف ۱) میخ چوبین سیاه چادر؛ ۲) کنایە از چُماق.

**بەرچیخ:** بەرچیت ف نگا: بەرچیت.

**بەرچیغ:** بەرچیت ف نگا: بەرچیت.

**بەرچیلك:** سیکەتۆرە، بەرجۆم ف چینەدان.

**بەرچێڵە:** گۆشتی ژێرچەنە ف غبغب.

**بەرچێن:** چاندنی پێش کێڵان ف کاشتن قبل از شُخم.

**بەرچینە:** بەرچن، تریان ف نگا: بەرچن.

**بەرچینەك:** بەرجۆم، سیقەتۆرە ف چینەدان.

**بەرچەلینك:** بۆتەی زێڕینگەران ف بوتهٔ زرگران.

**بەرخ:** بێچوی پەز، بەڕا ف برّهٔ گوسفند.

**بەرخستن:** بەراویتن ف سقط جنین.

**بەرخڤان:** شوانی بەرخان ف چوپان برّە.

**بەرخوار:** ۱) بەرخۆر، ئەوئازوقەی بەرلە زستان دەکار دەکرێ؛ ۲) قوماش یان جلکی راست نەبڕاو ف ۱) آذوقهٔ پیش‌خور؛ ۲) بُرش کج لباس یا پارچە.

**بەرخـواردن:** ۱) توش‌بون؛ ۲) بەهـرە؛ ۳) میوەخواردن؛ ۴) بریەتی‌لە ئیجـارەی باغ‌و...؛ ۵) ناڕەحـەت‌بون لەقسەی کەسێ: (بەقسەکەی **بەرم خوارد، پێم بەری خوارد**) ف ۱) مُلاقـات؛ ۲) بهـره؛ ۳) ثَمرخوردن؛ ۴) کنایە از اجارهٔ باغ و...؛ ۵) متأثر شدن از سخن یا کار کسی.

**بەرخۆر:** ۱) پێش‌خۆر، بەرخۆر؛ ۲) بەردکرۆژ، بریەتی لە خۆهەڵکێش‌و بافیش‌کەر؛ ۳) زگ‌لەوەڕێن، خۆ بەخەڵك تێرکەر ف ۱) پیش‌خور؛ ۲) کنایە از خودستا؛ ۳) مُردەخور، سورچر.

**بەرخوردار:** مراد حاسڵ، کامڕەوا ف برخوردار، کامیاب.

**بەرخۆرك:** تەزرەی ورد، تەرزەی وردیلە، تەیرۆ کێدهۆر ف تگرگِ ریز.

**بەرخۆلە:** بەرخەساوا ف برّهٔ نوازاد.

**بەرخەبەبە:** بەرچێلە، غەب غەبە ف غبغب.

**بەرخەفج:** موّتە، موّتەکە، شەوە ف کابوس.

**بەرخەل:** گەلەبەرخ، بەرغەل ف رمهٔ برّه و بُزغاله.

**بەرخەوان:** شوانی بەرخەل ف چوپانِ برّه و بُزغاله.

**بەرد:** کوچك، کەڤر، سەنگ، تەوەن، بەر ف سنگ.

**بەردا:** لەپێشدا، پێشوُ ف سابقاً.

**بەردار:** ١) داری خاوەن بەر؛ ٢) هەڵگر و بەسەبر: (چۆن خوا بەردارە؟) ف ١) درختِ مُثمر؛ ٢) شکیبا.

**بەرداش:** سەنگ ئاسیاو، بەرێنێش ف سنگِ آسیا.

**بەرداشت:** ١) بەهـرەی زەوی؛ ٢) بۆچـوون، لێکدانـەوە؛ ٣) دیباچە، سەرەتای کتێب ف ١) بهرهٔ زمین؛ ٢) نتیجەگیری؛ ٣) دیباچهٔ کتاب.

**بەردان:** لێکۆڵینەوە؛ ٢) بەرەڵاکردن ف ١) دقّت و مُلاحظه؛ ٢) رهاکردن.

**بەردانگ:** ژێرۆ، لای خوارەوە ف طرفِ پایین.

**بەردانەوە:** ١) لەژوورڕا فڕێدانەخوار؛ ٢) ئاو لەئەستێر بەرەڵاکردن: (بچۆ ئاو بەردەوە) ف ١) انداختن از بالا؛ ٢) آب را از استخر رها کردن.

**بەردانی:** ڕەقەن، بەردەڵان ف سنگلاخ.

**بەرداو بەرد کردن:** دانەمرکان لەماڵاو ئاوارەی چیا ف کنایه از آوارگی و آرام نگرفتن.

**بەرداوی:** بەردەڵان ف سنگلاخ.

**بەرداوێژ:** ١) بەردهـاوێژ، کەسێك کوچـك پەرت ئەکـا؛ ٢) مەودای بەردگەیشتن بەهاویشتن ف ١) سنگ‌پران؛ ٢) بُردِ پرتابِ سنگ.

**بەرداین:** چاوەدێری، ئاگاداری ف نظارت.

**بەردایی:** بەرەڵدا، ئازاد، ئازادو بەرهەڵدا کراو ف یله و رها، رها شده.

**بەردبڕ:** بەربڕ ف سنگ‌تراش.

**بەردتاش:** بەربڕ ف سنگ‌تراش.

**بەردڕانە:** نوقڵانەی بەرگی تازە. شیرنی جلکی نوێ ف انعامِ لباسِ تازه.

**بەردڕکانە:** بەردڕانە ف نگا: بەردڕانە.

**بەردڕەکانە:** بەردڕانە ف نگا: بەردڕانە.

**بەرد ریاگ:** بەردراو ف رهاشده.

**بەردکاری:** کاری بەردکردن، بەرد دەکارکردن ف سنگ‌کاری.

**بەردکێش:** ١) ئەڤیاکـە ڤرژخـەلکی راتینە؛ ٢) شەلتە، بارێکی دوتای دارینـە بەردو گڵـی پێ دەکێشـن ف ١) سنگ‌کش؛ ٢) ظـرفِ سنگ کشی.

**بەردڵ:** ١) خۆشەویست و لەبەردڵان؛ ٢) قلیان قاوەڵتی، بەرتێشت ف ١) محبوب؛ ٢) خوراكِ ناشتا.

**بەردڵك:** ١) خوشەویست؛ ٢) تورەکەی مەمکان ف ١) دوست‌داشتنی؛ ٢) پستان‌بند.

**بەردڵ کەوتن:** پەسندکردن ف پسندکردن.

**بەردم:** پێش ف جلو.

**بەردو:** بن‌دوگی مەڕ ف زیرِ دنبهٔ گوسفند.

**بەردو:** پڕژانی شیرکـاتی دۆشین بۆ دەرەوەی مەردۆش ف پاشیدن شیر هنگام دوشیدن بەخارج ظرف.

**بەردوخ:** ئامرازێکە لەدوخی خەرەکدا ف ابزاری در دوكِ نخ‌ریسی.

**بەردوگ:** بنی دوگی مەڕ، بەردو ف زیر دنبهٔ گوسفند.

**بەردولە:** ١) تەشتی گڵین بۆ نان‌تێنان؛ ٢) دەفری چڵکاوی ئاسنگەرو پینەچی ف ١) تشتِ سُفالین؛ ٢) ظرفِ آبِ کارِ آهنگر و پینەدوز.

**بەردوڵیان:** ئاردەشان ف نگا: ئاردەشان.

**بەردوێك:** سنگ و مەمك ف سینه و پستان.

**بەردە:** ١) بەنی، خولامی زێڕکڕی؛ ٢) ئەوداهاتە بۆ دەرەوە دەنێردرێ بۆ فرۆشتن؛ ٣) ڕفاندن و تاڵان: (عەجەب بگرەو بەردەیەکە) ف ١) بردە؛ ٢) صادرات؛ ٣) چپاول و غارت.

**بەردەئازەبە:** بەردێ کەخۆرت بۆ راکردنی کێ‌بەرکێ دەکەن ف سنگِ زورآزمائی.

**بەردەئەستێ:** بەردی ئاگر پڕێن ف سنگِ آتش‌زنه.

**بەردە ئەموستیلە:** نقیم، مۆرخوانە ف نگینِ انگشتر.

**بەردەبار:** پیاوی زاناو بەتەگبیر ف مُدبّر.

**بەردەباران:** کوچك واران ف سنگ‌باران.

**بەردەبـاز:** پردەبـاز، ڕیزەکـوچکێ لەناو چەم کە بەسەریا ئەپەڕنەوە ف سنگ‌های گُدار.

**بەردەبێر:** بەردێ کەشـوان لەسەری دەنیشێ و مێ بۆ دۆشەر دەگرێ ف سنگی کە چوپان برآن نشیند و گوسفند را برای دوشندە می‌گیرد.

**بەردەبیرۆ:** بەردێکـە بۆ ڕەقی و سەختی نمـونـەیە: (وەك بەردەبیروێ لێ‌هاتوە) ف سنگی کە بسیار سخت است.

**بەردەپـا:** سەنـگـی‌پا، بەردێکی ڕەشی کڕوزە کە لە گەرمـاو قاچی پێ‌دەشۆن ف سنگ‌پا.

**بەردەپێ:** بەردەپا ف سنگ‌پا.

**بەردەتـات:** بەردی پان و لوس لە ڕەخـی کانـی و ئاو بۆ نوێژو لەسەردانیشتن ف سنگی پهن و صاف کە در کنار چشمە قرار دهند و روی آن نماز گزارند و بنشینند.

**بەردەتراویلکە:** زیخە شینکە کەلەبەر تاو ئەترسکێ و وەك ئاو دیار دەکا ف سَراب.

**بەردەتوتن:** بەشێکی توتنانە بۆئاغا ف سهمیهٔ توتون ارباب.

**بەردەچەرخ:** سەنگی چەخماخ ف سنگ چخماق.

**بەردە چەخماخ:** بەردە چەرخ ف سنگ چخماق.

**بەردەرك:** پێش‌دەرك، پێش دەرگا ف جلو در.

**بەردەركە:** بەردەرك ف جلو در.

**بەردەرگا:** ١) ئاسانە، پێش‌ماڵ، بەردەرك؛ ٢) خەڵاتێکی زاوا بۆ بوك کە ئەیەوێ پەردەو دەرگای لێ‌بکرێتەوە ف ١) آستانه؛ ٢) هدیهٔ داماد به عروس.

**بەردەرێژ:** سەنگ فەرش ف سنگ‌فرش.

**بەردەزۆرە:** بەردێکی زبرە ئاوی پێدا دەکەن و چەقوی پێ تیژ دەکەن ف

سنگ سوهان.

**بەردەس:** بەردەست ف پادو.

**بەردەسـان:** هەسان، سان، بەردێکی لوس کراوە ڕۆنی لەسەر دادەنێن و تیخی پێ تیژ دەکەن ف فسان.

**بەردەساو:** بەردەسان ف فسان.

**بەردەست:** ۱) کەسێ لەبـەردەستـایەو خزمـەتی کەسێك دەکـا؛ ۲) ئەوشتەی دەستت پێڕادەگاو دور نیە؛ ۳) پارچە ئاسەڕی قۆڵ لەنزیك جومگەوە ف ۱) پادو؛ ۲) در دسترس؛ ۳) آستر آستین.

**بەردەستـە:** ۱) ئاسـەڕی قۆڵ؛ ۲) گیرۆدەو یەخسیر، ژێردەستە ف ۱) آستر آستین؛ ۲) گرفتار و اَسیر.

**بەردەستی:** ۱) خزمـەتکـاری، نۆکـەری؛ ۲) ژیانی گیرۆدەیی ف ۱) نوکری؛ ۲) اسارت.

**بەردەستێ:** بەردە ئەستێ ف سنگ آتش‌زنە.

**بەردەشۆر:** شوتنەوەی دەغل بۆ بەرد لێ جیا کرنەوە ف شُستن غلّە برای جدا کردن سنگ‌ریزە از آن.

**بەردەعازەبە:** بەردەئازەبە ف سنگ زورآزمایی.

**بەردەڤك:** ۱) نۆکەری هاوڕێی سەفەرو بەردەست؛ ۲) وێژەر لەباتی ئاغا ف ۱) نوکر همسفر با ارباب؛ ۲) سخنگوی ارباب.

**بەردەقانی:** قەڵماسك، قۆچەقانی، کەهنیك، تیروکەوان ف فلاخن.

**بەردەقی:** شەڕەشان، کێ بەرکێ لەشان لێکترداندا ف مسابقهٔ تنەزنی.

**بەردەڵان:** بەرداوی، زەوینی پر بەردو ڕەقەن ف سنگلاخ.

**بەردەڵبەرد:** بەرداوبەرد ف نگا: بەرداوبەرد.

**بەردەم:** ۱) بەردەم، پێش؛ ۲) دەمهەڵپێچ ف ۱) جلو؛ ۲) نقاب.

**بەردەمۆر:** مۆری جێ ئەنی شیعە لە سوژدەدا ف مُهر نماز.

**بەردەمـوکانە:** دەموکانە، مێوژۆکە، *بەری جۆرە دەوەنێکە، با دەبیا بە دارمـازووەوە بنـوسێت. دەروێنـەوە کوان‌ئاسـایی دەمـاسێ، دەیبڕن، دەیکوڵێنن، نوسەکێکی زۆر لەچرێش نوسەك‌تری لێ پەیدا دەبێ* ف مو یزك.

**بەردەموکە:** بەردەموکانە ف مو یزك.

**بەردەنوێژ:** بەردەتات ف سنگی صاف که بر آن نماز گذارند.

**بەردەواز:** بەردەباز ف نگا: بەردەباز.

**بەردەوان:** ڕازەوان، کەسێ کەبـاش بەشـاخ هەڵـدەگەڕێ، شاخـەوان، زەردەوان ف سنگ‌نورد.

**بەردەوك:** بەردەڤـك، نۆکەری تایبـەتیو خۆشەویستـی ئاغا ف نگا: بەردەڤك.

**بەردەهاڕ:** بەرداش ف سنگ آسیا.

**بەردەی:** بردن ف بُردن.

**بەردیل:** ۱) شت لەبـاتی شت، پێك‌گۆڕینـەوە، ماڵ‌بەماڵ، ژن‌بەژن؛ ۲) شەکی بەربەران ف ۱) معاوضه؛ ۲) شیشك سەساڵە.

**بەردین:** لەبەرد چێ‌بوُ، لەبەرد تاشراو ف ساخته شده از سنگ.

**بەردینـە:** ۱) بەردین؛ ۲) سێبەری بەرد: (خەوە **بەردینە** خۆشە) ف ۱) ساختەشده از سنگ؛ ۲) سایهٔ سنگ.

**بەرڕەت کەوتن:** توش‌هاتن‌و بەگیرهێنان ف گیر آمدن.

**بەرز:** ۱) برج، خانوەقوتکەی بان‌قەڵا؛ ۲) بڵند ف ۱) بُرج؛ ۲) بُلند.

**بەرزا:** هەوەڵ فرزەند ف اوّلین فرزند.

**بەرزاخ:** بەروار، قەدی کێو ف کَمَر کوه.

**بەرزاخور:** ئەسپێ کەفێرە لەئاخوڕی بڵندبخوا ف اسبی که از آخور بُلند بچرد.

**بەرزان:** ۱) شوێنانی بڵند؛ ۲) ناوی مەڵبەندێك و هۆزێك لەکوردستان ف ۱) بلندیها؛ ۲) منطقه و عشیرتی در کردستان.

**بەرزایەتی:** بڵندایەتی ف بلندی.

**بەرزایی:** بەرزایەتی ف بلندی.

**بەرزپەڕ:** بەرزفڕ ف بلندپرواز.

**بەرزفڕ:** ۱) مەلێ تا زۆر بڵندی دەفڕێ؛ ۲) چاو لەبەرەژور ف ۱) پرندهٔ بُلندپرواز؛ ۲) آدم بُلندپرواز.

**بەرزڤك:** تیغەو لەمپەر لە تەختەو دار ف مانع چوبی.

**بەرزکردنەوە:** هەڵێنان، ڕاکرن، بڵندکردن ف بُلندکردن.

**بەرزە:** ۱) قوتکە: (لێم بۆتە بەرزەی بانان)؛ ۲) قیتایی لەناو تەختاییدا؛ ۳) شیوی برنج، پڵاو، قبوڵی؛ ۴) بزر، گوم، وندابو، ون ف ۱) بُلند؛ ۲) برجستگی وسط هموار؛ ۳) آش برنج، پلو؛ ۴) گُم، ناپیدا.

**بەرزەبلێس:** ئەوی لەهەموقسان هەڵدەداتێ، زۆربێژی نەزان ف وراج و نادان.

**بەرزەبـا:** هەستـانی بەگورجی‌و ڕاست وێستـان: (بـەرزەبـا لەبـەرم ڕاستەوەبو) ف با عجله قیام کردن برای احترام.

**بەرزەپەڕ:** بەرزەفڕ ف بُلندپرواز.

**بەرزەجرە:** سیسرکی دەشت، جرجڕ ف جَراسَك.

**بەرزەجورە:** بەرزەجرە ف جَراسَك.

**بەرزەچرە:** بەرزەجرە ف جَراسَك.

**بەرزەحەوایلە:** کۆڵارەی منالان، بادەوە، تەیارەی کاغەزی ف بادبادك.

**بەرزەڕینـە:** زوبـەرجـەت، بەردێکی بەقیمـەتـە *دەیکەنە نقێم‌و قاش، زەردێکی ئاماڵ سەوزەو دەترووسکێ* ف زَبَرجَد.

**بەرزەفـڕ:** بەرزفر، چاو لە بەرەژور، ناڕازی بەوژیانەی تیایە: (هەرکەسێ بەرزەفڕە زو دەمرێ / بای بڵندایی سەرودڵ دەگرێ) «هەژار» ف بلندپرواز.

**بەرزەك:** بڵنـدایی نێوان تەختـایی. *ئەم وشـەیە عەرەب کردویەتـە «بەرزەخ»* ف بَرزَخ.

**بەرزەکی بانان:** ۱) قوتکەی بەسەرلێواری بانەوە؛ ۲) بریەتی لە لاوی تۆلازودڵتەڕ ف ۱) برجستگی لب بام؛ ۲) کنایه از جوانِ چشم‌چران.

**بەرزەگەوە:** دەستەکی پەرژین ف تار پرچین.

**بەرزەلنگ:** گیایەکی باڵابەرزە لەتیرەی پنگ‌و جاترە ف گیاهی از تیرهٔ پونه.

**بەرزەولاخ:** یەکسم ف ستور.

**بەرزەوبـــون:** ۱) ڕاست‌بونـــەوە، هەستـان؛ ۲) تەرەقی کردن ف ۱) بُلندشدن؛ ۲) کنایه از ترقی کَردن.

**بەرزەهەوایلە:** بەرزەحەوایلە ف بادبادك.

**بەرزی:** ۱) بلندی؛ ۲) گەورەیی ف ۱) بُلندی؛ ۲) بُلندپایگی.

**بەرزێتی:** بەرزی، بەرزایەتی ف نگا: بەرزی.

**بەرزیلان:** شێروخەت، ئەسکەملە ف بازی شیر یا خط.

**بەرزین:** ئەسپو ماینێ وەختی لێ‌سواربوُنی هاتبێ ف اسبی که هنگام زین‌کردنش رسیده باشد.

**بەڕزین:** شالاّو بوّ بردن، بەپەلەبوّچون ف با عجله و شتاب یورش بردن.

**بەرژەنـە:** بەرەمـەشکە، کەرەی لەیەك‌جار مەشکەژاندن پەیدادەبێ ف محصول کرهٔ یکبار مَشك.

**بەرژەنەك:** دەپی پێوانی کری تەون ف تختهٔ اندازه‌گیری تنیدهٔ فرش.

**بەرستوّ:** یەخە، خوار گەردنو بالاّی سینگ ف پایینِ گردن.

**بەرستە:** بەردئەستێ ف سنگِ آتش‌زنه.

**بەرسڤ:** وەرام، جواب، جوال ف جواب.

**بەرسڤك:** هەیوان، بەربێلایی ف ایوان، تراس.

**بەرسمبێل:** سەرەمـوی لێواری لێو کەمـوسـولّمان دەیقرتێنێ: (کافرە بەرسمبێلی خوّ ناکات) ف موی سبیل که بر روی لب آید.

**بەرسمێڵ:** بەرسمبێل ف نگا: بەرسمبێل.

**بەرسنجْك:** سوُکە نزگەرە ف سکسکه خفیف.

**بەرسورکە:** سیسرەی ناومالّ وەك قالوّچە دەچێ ف سوسك خانگی.

**بەرسوڤ:** وەرگەڕاو، نخون، قلّپ ف وارون.

**بەرسوێلینگ:** سنگ بەخەنە: بالّدارێکە ف پرنده‌ای است.

**بەرسوێڵ:** بەرسمبێڵ ف نگا: بەرسمبێڵ.

**بەرسێڵ:** کولێرەی بەساج برژاو ف نوعی گردهٔ نان.

**بەرسیلە:** قوّرە، کالکی‌ترێ، ترێی هێشتا ترش، پەسیرە، پەسیلە، هالّە ف غورە.

**بەرسینگ:** سینەبەندی زین ف سینه‌بندِ زین.

**بەرسینگـە:** ۱) بەرسینـگ؛ ۲) بریەتی لە ناوقەد: (بەفر بەرسینگەی بڕیـو)؛ ۳) پێش لێ‌گرتنو ڕێگـەی دەرچـون بڕین: (بەرسینگەی لێ‌بڕیمەوە) ف ۱) سینه‌بند اسب؛ ۲) کنایه از نیم‌قد؛ ۳) جلو راه قرار گرفتن.

**بەرسینە:** سینەبەندی زین، بەرسینگ ف سینه‌بندِ اسب.

**بەرشوش:** سەرەوژێر، بەرسوڤ ف وارونه، روبه پایین.

**بەرشی:** هاتەدەر، دەرکەوت ف بیرون آمد.

**بەرشیو:** بەرکـولّ، خواردن بەرلە چێشت پێ‌گەیشتن ف خوردن قبل از حاضر شُدن غذا.

**بەرشێو:** بەرشیو ف نگا: بەرشیو.

**بەرشیەن:** دەرکەوتوە ف بیرون آمده.

**بەرشیەی:** دەرکەوتن، هاتنەدەر ف بیرون آمدن.

**بەرعوّدە:** دەستەبەر ف متعهد.

**بەرغەل:** بەرخەل، گەلەی بەرخو کار ف گلّهٔ برّه و بُزغاله.

**بەرف:** بەفر، وەور، وەروە ف بَرف.

**بەرفخوّر:** بالّدارێکە ف پرنده‌ایست.

**بەرفخوّرْك:** جوّرێ تەرزەی ورد ف تگرگ ریز.

**بەرفرە:** بەرگوشاد، هەراو، پانو بەرین ف گُشاد.

**بەرفرە:** بەرفرە ف گُشاد.

**بەرفرێدان:** بەراویتن ف بچّه‌انداختن.

**بەرفمالّك:** پارۆی بەفرمالّین ف پاروی برف‌روبی.

**بەرفەشوّ:** شلّێوە، بەفرو باران پێکەوە بارین ف بارشِ برف و باران باهم.

**بەرفەك:** جوّرێ مێزەرو پێچەسەری پیاوانە ف نوعی عمامهٔ مردانه.

**بەرڤاژی:** بەراوەژو، سەرەونخون، پشتو ڕو ف وارونه.

**بەرڤالّە:** دەس بەتالّ، هەژار، نەدار ف کنایه از بینوا.

**بەرڤانْك:** بەروانکە، سینەبەندی کارکردن ف پیش‌بند.

**بەرڤی:** توّپیو، کەوتی، سەکـەت، مردو لە ڕێگـەی خراپەدا، بەرانبەری شەهیدبون ف هلاك شده.

**بەرڤین:** مردن لەڕێیِ خراپـدا، بەرانبـەری شەهیدبون: (ئەوێ مێرکوژ بەرڤی) ف هلاك‌شدن.

**بەرق:** ۱) بروسکە؛ ۲) تروسکە ف ۱) آذرخش؛ ۲) درخشش.

**بەڕق:** ڕکوُنی، ڕك‌لەسك ف کینه‌توز.

**بەرقلیان:** قاوەلّتی، بەرتێشت، بەرچایی ف ناشتا.

**بەرقوّڵ:** ئاسەڕی سەردەست لەکەوا ف آستر آستین.

**بەڕقەوە:** بەتوُڕەییەوە: (بەڕقەوە تماشای کردم) ف غضبناك.

**بەڕقی:** تروسکەی‌دا ف بَرق‌زد.

**بەرقییە:** تێلگراف، تەلغراف، لەتێلدان ف تلگراف.

**بەرك:** ۱) گوللە؛ ۲) گیرفـان، جێب، جیو، باخـەڵ؛ ۳) ئەستێرەیەکـە عەرەب ناوی ناوە: «*شەعـرای شامی*» ف ۱) گلولـه؛ ۲) جیب؛ ۳) ستارهٔ شعرای شامی.

**بەرکـاتی:** کرێکـاری بەوەختو سات: (ئێمـە بەرکـاتین بەگوێرەی سەعاتە کار موچە وەردەگرین) ف کارگر ساعت کار.

**بەرکار:** ۱) کەرستەی ئامادەکراو بوّ خانوکردن؛ ۲) کارکەر، بەرانبەری سەرکـار؛ ۳) مەفعولی ڕێزمانی ف ۱) مصالحِ ساختمانیِ آمادهٔ کار؛ ۲) عَمَله؛ ۳) مفعولِ دستوری.

**بەرکاز:** دەلاقەی دیواو دەر، پەنجەرە ف پنجره.

**بەرکـانی:** ۱) بەرەقانی، قەلّماسك، قوّچەقانی، کەهنیك؛ ۲) خواروی سەرچاوە ف ۱) فلاخن؛ ۲) پایینِ سرچشمه.

**بەرکاو:** داوێنی‌شاخ، بناری شاخ ف دامنهٔ کوه.

**بەرکرن:** لەبەرکردن، بوّدەرس‌و ... ف ازبَرکردن.

**بەرکم:** ۱) گولاّو؛ ۲) قەفەس ف ۱) گلاب؛ ۲) قفس.

**بەرکوّ:** ۱) قەلّپوزی‌زین؛ ۲) بەرکوتی دەغلّ؛ ۳) لای ژێروی خەرمان ف ۱) قرپوس؛ ۲) پیش‌کوبیدهٔ غلّه؛ ۳) پایینِ خرمَن.

**بەرکوت:** بەرکوّی دەغل ف پیش کوبیدهٔ غلّه.

**بەرکوتە:** بالّدارێکە، مەلێکە ف پرنده‌ایست.

**بەرکور:** بەرچێلّە، بەرخەبەبەی شوّڕ ف گوشتِ زیر چانه، غبغب.

**بەرکورە:** قولّتە: بالّدارێکی بچوکە ف پرنده‌ای کوچك.

**بەرکۆژە:** دادڕاوی یەخە تاسەر سنگ، بەر، پێسیر: (داخ لەدڵ بوُمە گرێی بەرکۆژە) «هەژار» ف گریبان.

**بەرکۆستە:** ریش تەنك و کەمموو ف ریش تُنك و کم‌مو.

**بەرکۆسە:** بەرکۆستە ف نگا: بەرکۆستە.

**بەرکۆش:** بەرەلبێنە، بەرهەلبێنە، کۆش‌پۆش لەکاتی کاردا ف پیش‌بند.

**بەرکوڵ:** تەواو نەکولاو ف نیم‌پخته، سرجوش.

**بەرکوڵ کردن:** پێش تەواوکوڵین لەشیو خواردن ف خوردن غذا قبل از پختن.

**بەرکۆڵە:** دارێ دولکە دەیخەنە ناو نێرەقەو مژانە ف از قطعاتِ خیش.

**بەرکـە:** خێر و بەرەکـەت، پیت: (مەرەسور **بەرکە**دا دوبەرخەمێ زاوە، هەی **بەرکەکەی**) ف بَرَکت.

**بەرکـەتی:** هەڵکـەوتـە، شیاوی رێزلێ گرتن، زۆر زرینـگ و بەکار ف شایسته و محترم.

**بەرکەش:** سینی، مەعجۆمە، مەجومعە، یاڵتەبەق ف طبق، سینی.

**بەرکەفتی:** بەرکەتی ف نگا: بەرکەتی.

**بەرکەك:** پەیژە، پێ‌پیلکە، ناردیوان، سلەم ف نَردبام.

**بەرکەڵ:** نێنگون، نوێنگین، نوگوهان، دامنەچەقان ف ماده‌گاو سه‌ساله.

**بەرکەل:** بەرکوڵ ف سرجوش.

**بەرکەمرە:** بەردێکە زو ئاگر دەگرێ، خەلوزە بەردی لەبەر رۆژورەنگ‌بوڕ ف زُغال‌سنگ.

**بەرکـەمـەر:** ١) گیایەکی گەرمـەسێری و بۆنخۆشە؛ ٢) سەربەرگەدە، بەرناوك ف ١) گیاهی است خوشبو؛ ٢) زیر ناف.

**بەرکـــەوتن:** ١) وێکـــەوتن: (بـــەردێ **بەرســـەرم کەوت**)؛ ٢) بەش لەدابەشدا: (لە گۆشت بەشێن‌دا پیلێکم **بەرکەوت**)؛ ٣) وەبن کەوتن: (دەستم **بەرچەرخ کەوت**)؛ ٤) نۆرە، نۆبە: (وا زو **بەرم ناکەوێ**) ف ١) اصابت کردن؛ ٢) سهم رسیدن؛ ٣) زیرافتادن؛ ٤) نوبت.

**بەرکهۆر:** تفنگی لولەتەنگ ف تفنگِ لوله‌تنگ.

**بەرکەیە:** ١) بریکار، نوێنەر؛ ٢) یاریدەر، هاریکار ف ١) نماینده؛ ٢) همکار.

**بەرْگ:** پێشو، بەرێ: (جاری **بەرْگ** هاتم نەتم‌دی) ف قبلی.

**بەرگ:** ١) گەڵا، پەلـك، بەلگ؛ ٢) پشتەکتێب؛ ٣) پۆشاك، جلك؛ ٤) دۆز، مەڕام ف ١) برگ؛ ٢) جلد کتاب؛ ٣) لباس؛ ٤) مَرام.

**بەرگا:** کەسێ پێش گای تازەجوت دەکەوی تا فێری کا ف آنکه گاو را شخم آموزد.

**بەرگاز:** کوُتاڵی بەرپان ف پارچهٔ عریض.

**بەرگـایلکـە:** چوێلە کۆکـەیەکی رەش و سپیە لەخـەتی جوت دوای گا دەکەوێ، قون‌هەلتەکێنە، کلك هەلتەکێنە ف پرندهٔ دُم‌جُنبانك.

**بەرگـایی:** بونـەبەرگا، پێش گاکەوتن لەجوتا بۆ راهێنانی، هەقۆتن ف عَمَل شُخم به گاو آموختن.

**بەرگ تێگـرتن:** ١) جلدکـردنی کتێب؛ ٢) دەقـومـاش هەڵکێشـانی لێفەو... ف ١) جلدگرفتن کتاب و...؛ ٢) ملحفه کشیدن رختخواب.

**بەرگ‌درو:** جلددرو، خەیات ف خیّاط.

**بەرگدور:** بەرگ‌درو ف خیّاط.

**بەرگـر:** ١) لەبـات، جلك یان دەفـرێکی کەم‌نرخ دەکار کردن تا تازەو بەنرخ کۆن نەبێ یا نەشکێ؛ ٢) پێشگر: (**بەری ئاوەکە بگرە، بەرگری لەشکـرەکە بو، بەری لێ گرتن**)؛ ٣) ژنێ کە منالی بەسوتان مردوە، *ودمی پێیە خوێ و ترشی سمـــاق بەزیپکـــەو بلۆقی ئاگرەدا کات و نەهێلی بتەنێتەوە* ف ١) استفاده از کهنه و بی‌ارزش جهتِ حفظِ تازه و ارزنـده؛ ٢) سدّ و مانـع؛ ٣) زنی که بچـه‌اش در آتش سوختـه ـــ به‌اعتقادی ـــ با ریختنِ نمك و سُماق بر جوش و تاول آنها را از بین می برد.

**بەرگرانە:** کۆمەك و هیمدادبۆ شەڕکەرانی چەکدار ف کمك پشت جبهه.

**بەرگرتن:** ١) کاری بەرگری؛ ٢) خۆراگرتن و توانست لەبەر دژواری یان لەبـەرانبـەر لەخۆ بەهێزتر؛ ٣) مێوەدانی دار؛ ٤) ئاوی زاخ لەکوُتاڵی رەنگ کراودان تا کاڵ نەبێتەوە ف ١) دفاع؛ ٢) تاب و مقاومت در برابر بلایا...؛ ٣) به‌ثمرآمدن درخت؛ ٤) به‌کارگیری زاج برای ثابت ماندن رنگ پارچه.

**بەرگرد:** شتی نەخۆشەویست لەباتی خۆشەویست دەکارکردن، بەرگر ف به‌کارگرفتن بی‌ارزش برای حفظ باارزش.

**بەرگردەڵە:** دارێکە دەخرێتەژێر پازناو ف چوبك زیر اهرم.

**بەرگری:** بەرگرتن ف دفاع.

**بەرگ گرتن:** بەرگ‌تێ‌گرتن ف تجلید.

**بەرگن:** لوا، کولکەی وشتر و بەرخ ف پشم شتر و بَرّه.

**بەرگورد:** دارگورد، دارێ لەنێوان رایەل و پۆی تەون‌دا بۆ راست کردنی پۆ ف چوب میان تاروپود در قالی‌بافی.

**بەرگـە:** تاقـەت، توان، پێ‌وەستـان، دەربردن: (**بەرگەی حەملەی من ناگرێ**) ف تاب و توان.

**بەرگەدە:** جێگەی روانی توُکەبەر، لای هەرەخواروی ورگ ف زهار.

**بەرگەڕ:** خوانچەی دەسفرۆشی ناو بازار ف صندوقچهٔ پیله‌ور.

**بەرگـەڕەکێ:** جوانی گەڕەك. *زۆرتـر بۆ کەڵەباب و ئەسپی دەڵێن* ف زیبای محلّه، بیشتر برای خروس و اسب به‌کار می‌رود.

**بەرگەش:** بەرکەش، یاڵتەبەق، سینی ف طبق، سینی.

**بەرگەشتە:** کلۆڵ، چارەڕەش، بەدبەخت ف بدبخت.

**بەرگەشتی:** بەدبەختی، نەهات ف بدبختی.

**بەرگە گرتن:** دەربردن، دەگەڵ دەردو دژواریدا هەڵکردن ف تاب آوردن و مقاومت.

**بەرگەل:** بەرخەل ف گلهٔ برّه.

**بەرگەڵا:** بەرێکە لەگەڵای دارمازودەر دەچێ ف از ثمرهای مازوج.

**بەرگەلە:** دوا شوان، یاریدەری شوان ف دستیار چوبان.

**بەرگەلەوان:** شوانی بەرغەل ف چوپانِ برّه و بزغاله.

**بەرگەمێ:** کیاکوُز، کوُزەڵە ف ترتیزكِ آبی.

**بەرگەمێو:** پەلکەمێو، گەڵامێو، ئاپراخ ف برگ مَو.

**بەرگیر:** ماری ژەهراوی حەستەم ف مارِ افعی.

**بەرگیرخستن:** هێنانەگیر، وەگیرهێنان ف گیرآوردن.

**بەرگیرکەوتن:** وەبەردەست هاتن ف گیرآمدن.

**بەرگیری:** پاریزگاری لەولات، بەگژ دوژمندا چون، پیش بەدوژمن گرتن ف دفاع.

**بەرگین:** پیشینە، لەمیژ ف پیشینە.

**بەرما:** بەرماوی خواردن ف نیم‌خوردە.

**بەرماخ:** جوریّ پەرەسیغاری لولەیی کە توتنی تیدەکەن، پەرە جگەرەی قامیش یا قەمیش، بارماخ ف نوعی کاغذ سیگار.

**بەرماغ:** بەرماخ ف نگا: بەرماخ.

**بەرمال:** ١) پیش‌دەرگا؛ ٢) ئەوی نویژی لەسەر دەکەن، دوگرد؛ ٣) بناوانی مال؛ ۴) پارچەیی لەکاتی هاتنی بای بەهیزدا بەسەر چادریەوە دەگرن تا با زورکار لە رەشمال نەکا، باگیرەوەی تاول ف ١) جلو خانە؛ ٢) سجّادە؛ ٣) خانەدار؛ ۴) پارچەای محکم کە هنگام طوفان بر چادر زنند تا آسیب نبیند.

**بەرمالك:** جاجم، مەوج ف جاجیم.

**بەرمالە:** ١) بناوانی مال؛ ٢) پاشمالە، مالەهەژاریکی خزمەتکاری مالیکەو جیگەیان داوەتیّ، ژیرمالە ف ١) کدبانوی خانە؛ ٢) خدمتکاری کە در خانە اسکان دهند.

**بەرمالی:** بناوانی مال ف خانەدار.

**بەرماو:** بەرما ف نگا: بەرما.

**بەرماوە:** بەرما ف نگا: بەرما.

**بەرمنەت:** منەت‌بار، مەمنون، چاکەلەسەر ف ممنون.

**بەرمور:** گەردانە لەمت‌و مورو ف گردن‌بند از مهرە.

**بەرموسولدان:** ژیرمیزەلدان، توزیّ بەرەوژورتر لەگون ف مثانە.

**بەرمەجیل:** دەرگاو دیواری لەشولك، چەپەر ف دیواری از ترکە کە بر دور حصار و باغ و قلعە و امثال آن کشند.

**بەرمەمکان:** منالی شیرەخور ف طفلِ شیرخوارە.

**بەرمەمکانە:** بەرمەمکان ف شیرخوارە.

**بەرمەی‌تاوی:** بەرهەیوان ف نگا: هەیوان.

**بەرمیل:** بوشکە، دەفری گەورەی دارین بو تراو، کوپەی داری سەرگیراو ف بُشکە.

**بەرمیو:** پەلکەمیو، ئاپراخ، گەلامیو ف برگ مو.

**بەرناف:** لەقەم، لەقەب، نازناو ف لَقَبْ.

**بەرنامە:** پەیرەوی نوسراو بو کومەل‌و حیزب ف برنامە.

**بەرنویژ:** ئیمامی جەماعەت، پیش‌نویژ ف امامِ جماعت، پیشنماز.

**بەرو:** دادراوی یەخە، پیسیر؛ ٢) پیشین، لەمیژ: (لەزەمانی بەرودا)؛ ٣) ئەبەم ف ١) گریبان؛ ٢) پیشین؛ ٣) می‌برم.

**بەرو:** ئەبا، ئەیبا، ئەیوا ف می‌برد.

**بەرو:** ١) بەری داریکی لیری‌و زور ناسراوە، پیاویش دەیخواو دەش بیتە ئالف؛ ٢) بەریزو حورمەت: (پیاویکی بەروە)؛ ٣) بیّ‌شەرم‌و قسەرەق ف ١) بلوط؛ ٢) مُحترم؛ ٣) پُررو.

**بەروار:** گەوە، ناوقەدی کیو ف کَمرِ کوە.

**بەروال:** بەروار ف کمرکوە.

**بەروالەتی:** بەنما، بەزاهیر ف ظاهراً.

**بەروان:** سینگ‌پوش، ئەوپارچەی لەوەختی کارا یان لەوەختی نان‌خواردنی منالان بەسینگەوە دەبەستریّ ف پیش‌بند.

**بەروانك:** بەروان ف نگا: بەروان.

**بەروانکە:** بەروان ف نگا: بەروان.

**بەروانە:** بەروان ف نگا: بەروان.

**بەروبو:** ١) بەهرەی زەمین، داهاتی زەوی؛ ٢) ماوەو مەودا: (زستانی ئەمسال وادیارە **بەروبو** دریژدەبیّ) ف ١) بهرۀ زمین؛ ٢) مُدّت.

**بەروبوخچە:** جلك‌و کەلوپەلی تایبەتی ژن: (**بەروبوخچەی** تیك‌ناوە، دەروا) ف بُخچە و وسایل مخصوص زنان.

**بەروبوم:** بەروبو ف نگا: بەروبو.

**بەروبیشکە:** لانك بەکەل‌و پەلەوە، بیشکەو ئەسپابی بیشکە، دەرگوش‌و هەرتشتین ویّ ف گهوارە و لوازم آن.

**بەروپشت:** بەراوەژو، واژی، پشتەو رو ف وارونە.

**بەروپیر:** پیشوازی، بو ریز لەپیاوی ماقول دەرکەوتن لەمال، بەرەوپیرایی ف استقبال.

**بەرودوا:** ١) بەدوی یەکا هاتن، یەك لەدویەك؛ ٢) بەرەوپاش، روبەدواوە ف ١) توالی و تسلسُل؛ ٢) بەعقب.

**بەرودواخستن:** ١) پیش‌وپاش کردن؛ ٢) مەحتەل کردن‌و پاشگویّ هاویشتن ف ١) پس و پیش کردن؛ ٢) پس گوش، انداختن.

**بەرودواکردن:** پاش‌وپیش کردن ف پس و پیش کردن.

**بەرودوانان:** شوین هەلگرتن، وەدوا کەوتن بو پیّ گەیشتن ف تعقیب کردن.

**بەروژ:** ١) بەربەروچك؛ ٢) گوند یا مەزرای روەو روژ؛ ٣) لەروژدا، بەرانبەری لەشەودا ف ١) آفتاب‌گیر؛ ٢) دهکدە یا مزرعۀ رو بە شرق؛ ٣) در روز.

**بەروژو:** مانگرتو لەخواردن لەروژدا ف روزەدار.

**بەروژی:** بەروژو ف روزەدار.

**بەروسەی:** بەراویتن، بیچو بەمردویی فریدان ف انداختن بچّە.

**بەروش:** بەشیکە ئاشیر دەیدا بەئاشەوان ف سهمِ آسیابان از آسیاب.

**بەروش:** قازان، مەنجەل، قەزان ف دیگِ مسی.

**بەروڤاژی:** بەراوەژو، بەروپشت ف واژگون.

**بەروك:** پیسیر، یاخە، بەرو ف گریبان.

**بەروك بەردان:** بریەتی لە دەست لەیاخە کرنەوە، لەکول کەوتن، دەڤ‌ژیّ بەردان ف گریبان رهاکردن.

**بەروك گرتن:** بریەتی لە تەشقەلە پیّ‌کردن، شەر پیّ‌فروشتن، گەر تیّ‌هالاندن ف گریبان گرفتن.

**بەرولە:** ١) خەیاری تازەگوراوی بەقەد قامك؛ ٢) داروکیکە دەناو پاش‌بارەو دەستەندودا ف ١) خیار نوبر ریز؛ ٢) چوبکی در خیش.

**بەروەج:** ١) ئاسنیّ کە تفەنگی لیّ دروس دەکەن؛ ٢) بریەتی لە تفەنگ ف ١) پولاد؛ ٢) کنایە از تفنگ.

**بەروەستا:** شاگردی سنعاتکار، بەردەستی پیشەساز ف شاگرد کارگاە.

**بەروەسیل:** ناوگورك، ئاگردان، تفك، کوانو ف آتشدان.

**بەرە:** ١) ببە، بوە: (ئەمە بەرە بۆ پیرۆت)؛ ٢) دەنگ‌دانی گا بۆ گەڕانەوە لەسەری خەت، بەرکە بەم‌لاوە یان وەرەوە لای خەت‌لێ‌دراو؛ ٣) تیرە، تایفە: (خانی دمدم لە بەرەی برادۆست بو)؛ ٤) سینەبەندی ئەسپ کە بە تەنگە زینەوەیە؛ ٥) دەرگا؛ ٦) بەس کردنی باران؛ ٧) پلە، کەمە؛ ٨) بەهـرە، داهـات: (بەرەجوت، بەرە مەشکە)؛ ٩) مەودای نێوان شەو جۆلا لەکـاتی بوزو تەنینـدا؛ ١٠) خشت‌وخـاڵ: (بـەرەمێو) واتـا: خشت‌وخاڵی *ناوخەڵیف*؛ ١١) روبە: (بەرەوخوار، بەرەوژور) ف ١) ببَر: ٢) کلمهٔ صدازدن گاو هنگام شخم؛ ٣) عشیره؛ ٤) سینەبند اسب؛ ٥) درب؛ ٦) بنـدآمدن باران؛ ٧) بتدریج؛ ٨) بهرهٔ کشاورزی و کرهٔ منسك؛ ٩) فاصله بین بافنده تا دَفّه؛ ١٠) آت‌و آشغال؛ ١١) بطرف.

**بەڕە:** گڵێم، بەڕ، لەی ف گلیم.

**بەرەبـەرە:** ١) کەم‌کەم‌و بەتـەدریج؛ ٢) جوٗن پاشی‌جوٗن، دەستە دوای دەستە: (بەرەبەرە هاتن‌و گەیشتن) ف ١) کم‌کم و بتدریج؛ ٢) صف بعد از صف.

**بەرەبەری بەیان:** نزیك بەرۆژ بوٗنەوە ف نزدیکیهای صبح.

**بەرەبەیان:** بەربەیان، بولێڵەی بەیان ف بامداد، پگاه.

**بەرەبیڵ:** بەرەجوت، داهاتی زەوی ف بهرهٔ زمین.

**بەرەبێن:** دەم‌بێن، زاربێن ف دهان‌بند.

**بەرەتـەشی:** کوتەداریکی پانکەڵەی گروٚڤەرە دە کلکەتەشی ڕادەکەن تا قورس بێ ف چوبکی مدوّر و سوراخ در پایینِ دوك.

**بەرەتی:** بریەتی، کنایە ف کنایه.

**بەرەج:** چارە، عیلاج ف چاره.

**بەرەجفت:** بەرەبیڵ ف بهرهٔ کشت.

**بەرەجوت:** بەرەبیڵ ف بهرهٔ کشت.

**بەرەجەژنان:** بەرەجیژنان ف نزدیکیهای عید.

**بەرەجیژنان:** ڕۆژانی نزیك‌بە جیژن ف نزدیکیهای عید.

**بەرەخوار:** روبەلای ژێر وف روبەپایین.

**بەرەخوارە:** لێژایی، نشێو ف نشیب.

**بەرەخەر:** ١) جێ باروبنەی کاروان؛ ٢) ماك‌وداکێك بێچویان بەمردویی دەبێ ف ١) جای اطراق؛ ٢) جنین‌انداز.

**بەرەڕەت:** مردەو زیندە، قوڵکەو چاڵی سەر ڕێبازی نەچیر ف کمینگاه.

**بەرەریخ:** دیوارۆکـــەی پشتیوانـــەی دیوار ف دیوار کوتـاهی که برای محافظت از دیوار اصلیِ بنا کنند.

**بەرەزا:** یەکەمین بێچو، یەکەم فرزەند ف نخستین فرزند.

**بەڕەزا:** گیایەکی زۆرجـوانـە بەکـاوانـەوە دەڕوێ: (پێش ئەوەی شنەی بەیانی زولفی بەڕەزا ببزێوێ) «هێمن» ف گیاهی است بسیار زیبا که در کوهستانها می‌روید.

**بەرەزبانە:** ئاغزونە، سێر، ئاڵقەو زمانەی کەوش‌و قایشی پشت‌و ... ف سگك.

**بەرەزمانە:** بەرەزبانە ف سگك.

**بەرەزوانە:** بەرەزبانە ف سگك.

**بەرەزە:** تەرە، ئاوارەو سەرلێ شێواو ف آواره.

**بەرەزی:** میوەی دڕکەزی، دڕوی پەرژین ف میوهٔ خار پرچین.

**بەرەژان:** ژانەدرۆزنە، ژان‌لێ هاتنی زگ‌پڕ بەرلە وەختی ژانی زان ف درد کاذب پیش از زایمان.

**بەرەژور:** روەو بڵندی ف سر بالایی.

**بەرەژورە:** هەوراز، ئەڤراز، هەل ف سر بالایی.

**بەرەژە:** جیوەی گیا ف سمغ و انگم گیاه.

**بەڕەژە:** گیایەکە بۆ دەرمانی منداڵان دەبێ ف گیاهی داروئی.

**بەرەژەنە:** بەرەمەشکە، ڕۆنی یەکجار مەشکەژاندن ف کرهٔ یکبار مشك زدن.

**بەرەژێر:** نشێو، سەرەو خوار ف سرازیر.

**بەرەستی:** بەرد ئەستێ، بەردی ئاگرپژێن ف سنگ آتش‌زنه.

**بەڕەشك:** گیایەکە ف گیاهی است.

**بەرەشۆ:** بەردەشۆر ف شستن و پاك کردن حبوبات.

**بەرەڤان:** ناوبژیکار، کەسێ کەدەبێتە مایەی ئاشت کردنەوەی دودژ ف میانجی.

**بەرەڤانی:** ناوبژی کردن، نێوان کردن ف میانجی کردن.

**بـەرەك:** ١) بەرۆك؛ ٢) بـەرەی زینی ئەسـپ ف ١) گریبـان؛ ٢) سینەبندِزین.

**بەرەگـە:** ١) جێ گەڕانـدنـەوەی ئاو؛ ٢) ڕێبازی نچیر کەڕاوکەر پێشی دەگرن ف ١) سدّ، برغاب؛ ٢) مسیر عبور شکار که شکارچی در آنجا کمین کند.

**بەرەگەڵا:** پۆرگێکی سورو سپی کە لەگەڵای دارمازو دەردەچێ ف ثمر تاول مانندی که از برگ مازوج بیرون آید.

**بەرەڵا:** ڕەهـا، بەرەڵـدا: (ئـەسپـەکە **بەرەڵا** بوە، لەزیندان **بەرەڵا** بوم، بەرەڵایە گوێ ناداتە عەیب‌و عار) ف ول، یله، لاقید.

**بەرەڵبێنە:** پێش‌بەند، پارچەی داپۆشی کەمەر تا ئەژنۆ لەکاتی کاردا ف پیشبندکار.

**بەرەماك:** بێچوی بەرەڵدا دەگەڵ دایك کە بەئازادی شیر دەمژێ‌و دایکی نادۆشن ف بچه حیوانی که تمام شیر مادر را به او بدهند.

**بەرەماڵ:** خانەدان، ماڵەگەورە، گەورەماڵ ف خاندان.

**بەرەمۆ:** بێچوی ئاژەڵ کەدەم لەگوان ناکاتەوەو بەزۆر دوری دەخەنەوە ف بچه حیوانی که به زور از پستان مادر جدا می‌شود.

**بەرەمۆم:** بەرەمێو ف آشغال کندوی عسل.

**بەرەمەشکە:** کەرەی جارێك مەشکەژاندن، بەرەژەنە ف نگا: بەرەژەنە.

**بەرەمێو:** خشت‌و خاڵی ناو پلورەمێش ف آشغال کندوی عسل.

**بەرەندك:** پێشواز ف پیشواز، استقبال.

**بەرەنگـار:** دەگژراچـو، ئاوقـا: (ئەو **بەرەنگارم** بو، منیش **بەرەنگاری** بومەوە) ف گلاویز.

**بەرەنگاری:** بەرانبەری کردن، دەگژراچون ف گلاویزشدن.

**بەرەواژ:** بەراوەژو، واژی، پشت‌ورۆ ف وارونه.

**بەرەوبـڕ:** ڕێ لێ‌بڕین، پێشـە برکێ، پێشەبڕکە: (دیتم هەڵات گورجێ بەرەوبڕم داوەوگرتم) ف سر راه گرفتن بر...

**بەرەوبیەی:** بەرەوبون، بەربونەوە ف پایین افتادن.
**بەرەوپاش:** روبەدواوە، بەرەو دواوە: (**بەرەوپاش دەگەڕاوە، بەرەوپاش ئاوڕیداوە**) ف رو به عقب.
**بەرەوپیر:** بەپیرەوە چون، پێشـوازی: (بـاوە غەڵیفـە تەشـریفی هات، **بەرەوپیری چوین**) ف استقبال.
**بەرەوپێڵ:** سنگو بەردابۆشی وەختی کار، بەرانپیچ، بەرانپێڵ ف پیشبند.
**بەرەوخستن:** خستنە پێشەوە، کەسێك لەڕێگە ئەیخەنە پێشەوە ف جلو انداختن.
**بەرەوخوار:** نشێو، سەربەرەژێر ف رو به پایین.
**بەرەو خواربونەوە:** سەربەرەژێر چون ف سرازیر رفتن.
**بەرەو خواركردنەوە:** لارەوكردنی دەفرو... ف كج داشتن ظرف و...
**بەرەو خواركە:** بەرەوخوار ف بطرف پائین.
**بەرەو خوارە:** بەرەو خوار، نشێو ف رو به پائین.
**بەرەودوا:** بەرودوا ف نگا: بەرودوا.
**بەرەودوانان:** كەوتنە شوێن، بەرودوانان ف تعقیب كردن.
**بەرهۆر:** بەرك‌هۆر، تفەنگی خانەتەنگ ف تفنگ خانه‌تنگ.
**بەرەوڕو:** ١) ڕوبـەڕو، ئیزبار: (ئەڵێ قەرزاری نیم؟ **بەرەوڕوم بكەوە** تا پێی بڵێم)؛ ٢) حەواڵە: (وامەكەم **رویبەروی** پیروت بكەرەوە) ف ١) روبرو؛ ٢) حواله.
**بەرەوژور:** روبەبڵندی ف رو به بالا.
**بەرەوژوركە:** هەورازی كەم ف افراز.
**بەرەوژورە:** هەوراز ف افراز.
**بەرەوژێر:** روبەخوار، لێژ، نشێو ف رو به پایین، سرازیر.
**بەرەوژێركە:** كەمێك نشێو ف سرازیری كم.
**بەرەوژێرە:** نشێو ف نشیب.
**بەرەولا:** قیچـەڵقاچ، قیلەقـاچ، خوار بـردراو، خوارەوخـوار ف اریب، قیقاج، كج.
**بەرەولێژ:** رووەونشێو ف شیبدار.
**بەرەولێژایی:** رووەونشێوی ف شیبداری، سرازیری.
**بەرەولێژكە:** رووەونشێوی كەم ف سرازیری كم.
**بەرەولێژە:** رووەنشێوی ف رو به سرازیری.
**بەرەولێژی:** بەرەولێژە ف رو به سرازیری.
**بەرەوە:** ١) لای‌پێشەوە؛ ٢) لای‌ژێرو ف ١) جلوی؛ ٢) زیری.
**بەرەوەبون:** بەربونەوە ف افتادن از بالا.
**بەرهەڤ:** ١) ئامادە، تەیار؛ ٢) كۆم لەسەریەك ف ١) آمادە؛ ٢) برهم انباشته.
**بەرهەڵبینە:** بەرەڵبینە ف پیشبند.
**بەرهـەڵست:** ١) دوژمن، دژ؛ ٢) لەمپـەر، كۆسـت: (**بەرهەڵستم زۆرن، بەرهەڵستم** دەخەنە ریگەوە) ف ١) دشمن، مخالف؛ ٢) مانع سر راه.
**بەرهەڵێخ:** دیوارۆكەی بن دیواری شكست بۆئەوە نەتەپێ، پشتیوانە ف پشتیوانهٔ دیوار.
**بەرهـەم:** ١) بەهرە، داهات، بەش، ئینتاج، تەولید؛ ٢) تێكەڵ: (دەرهەم بەرهەم) ف ١) بهره، حاصل؛ ٢) قاطی.
**بەرهەم‌هێنان:** رەنێوهێنان، بەخێوكردن، پێ‌گەیاندن ف به نتیجه رسانیدن.
**بەرهەنگ:** نەخۆشی تەنگەنەفەسی كە زیاتر پیر توشی‌دێن ف تنگ نفسی.
**بەرهێڤی:** بەهومێد، بەئاوات ف آرزومند.
**بەرێ:** رەوا، بەجێ، عاقـڵانە: (كاران **بەرێ و جێ** دەكا، قسەی **بەرێ‌و جێن**) ف روا، بجا.
**بەرێ:** ١) لەپێشودا؛ ٢) بەڵێ ف ١) از قبل؛ ٢) آری.
**بەڕێ:** ١) بەرێزو قەدر، بەڕو؛ ٢) میوەی داربەڕو ف ١) محترم؛ ٢) بلوط.
**بەری:** ١) داری بەرهێن: (داری **بەری** بەنرخە)؛ ٢) گیرفان، بەریك؛ ٣) بێ‌گوناح؛ ٤) بەش ف ١) درخت میوە؛ ٢) جیب؛ ٣) بی‌تاوان؛ ٤) سهم.
**بەریان:** پێش بۆ ئاویان بۆ با: (**بەریانی** ئاو بگرە، **بەریانی** با بەردە) ف گُذر آب و باد.
**بەڕێ بردن:** بەخێو كردن: (كاكم **بەڕێمان** دەبا) ف سرپرستی كردن.
**بەڕێچون:** ژیان، گوزەران كردن ف زندگی.
**بەریڤان:** بەرەڤان، ناوبژیكەر ف میانجی.
**بەریڤانی:** ناوبژی كردن، نێوان كردن، بەرەڤانی ف میانجیگری.
**بەڕێ كردن:** ١) بۆ حورمەت دەگەڵ میوان ماوەیەك ڕۆیشتن تا دەرڕوا؛ ٢) ناردن، شاندن ف ١) بدرقه كردن؛ ٢) فرستادن.
**بەرین:** ١) پان، هەراو؛ ٢) بەروك؛ ٣) پێشین، لەمێژینە ف ١) عریض، ٢) گریبان؛ ٣) پیشین.
**بەرینایی:** پانایی، پانی، هەراوی ف پهنایی.
**بەرینجك:** داری لەئەندازەی فەرش كەدەپشتی تەون دەخرێ ف چوبی كه در عرض دار قالی قرار دارد.
**بەرینگاڵ:** پەزی تیسك درێژ ف گوسفندِ پشم دراز.
**بەرینی:** بەرینایی ف پهنایی.
**بەرێ‌وجێ:** ١) عاقڵانەو پەسند؛ ٢) لە ئەسپابی میوانداریدا سازو تەیار ف ١) بجا، عاقلانه؛ ٢) آمادهٔ پذیرایی.
**بەرێوشوێن:** ١) لەكاری كۆمەڵایەتی زانا؛ ٢) تەكوزو مورەتەب ف ١) آگاه به كارهای اجتماعی؛ ٢) مرتّب.
**بەڕێوەبردن:** ئیدارەكردن، پێچاران ف اداره كردن.
**بەڕیە:** بیابان ف بیابان.
**بەز:** ١) پیو، چەوری هەناوی حەیوان؛ ٢) غاروڕاكردن: (ماینەكە خۆش دەبەزێ، ببەزەو زو بگەیە)؛ ٣) بەرەوخوار هاتن: (لە ئەسپ دابەزە)؛ ٤) خۆهـەڵدان: (هەڵبەزە)؛ ٥) دەنێو وشەدا بەواتا شكست‌خواردن: (فـلانكەس لەشەر بەزی، پیروت نەبەزە)؛ ٦) پاشگری بەواتا جێی ئیسـراحەت‌و پشودان: (ئوردو بەز) ف ١) پیه؛ ٢) دویدن؛ ٣) پائین آمدن؛ ٤) ورجهیدن؛ ٥) هزیمت؛ ٦) پسوند بەمعنی مكان اُطراق.
**بەزا:** خۆشڕەو، خۆشبەز ف بادپا، تندرو.
**بەزاج:** شوفاریو شەیتانی، دوزمانی ف سخن‌چینی.
**بەزاجكەر:** شوفار، شەیتانی‌كەر، نێوان تێكدەر، دوزمان ف دوبهم زن،

نَمّام.

**بەزاخ:** دوزمان، شوفار ف سخن‌چین، جاسوس.

**بەزاز:** کوتاڵ فرۆش، گەز فرۆش ف قُماش فُروش.

**بەزان:** ۱) بەزین، شکست خواردن؛ ۲) غاردان، هەڕاکردن؛ ۳) هاتنەخوار لەسواری ف ۱) شکست خوردن؛ ۲) دویدن؛ ۳) فرود آمدن، پایین آمدن.

**بەزاندن:** ۱) شکست پێدان: (لەشەڕدا **بەزاندم**)؛ ۲) مێزدە لانکە کردنو لە بلوێر دەرکەوتن: (منالەکە فێری **بەزاندن** بوە، شەو لەبێشکە دەمێزێ) ف ۱) شکست دادن؛ ۲) در گهواره شاشیدن.

**بەزانن:** شکست پێدان، بەزاندن ف شکست دادن.

**بەزتن:** ۱) داوەزین؛ ۲) بارخستنی کاروان ف ۱) پایین آمدن؛ ۲) اُطراق کردن.

**بەزدونەك:** ترسەنۆك، تەرسۆنەك، قزە ف ترسو، بُزدل.

**بەزدین:** ۱) ترساندن: ۲) ترسان ف ۱) ترساندن؛ ۲) ترسیدن.

**بەزر:** ۱) بزر، گوم؛ ۲) تۆم ف ۱) گُم شده؛ ۲) تُخم گیاه.

**بەزرۆك:** بزرۆك، زیپکە لەلەش، وردە زیپکە ف جوش ریز.

**بەزرەونج:** گیایەکی زۆر بۆن‌خۆشە ف گیاهی است خوشبو.

**بەزگەر:** وەرزێر، فەلاح، جوت‌بەندە ف برزگر.

**بەزم:** ۱) شادیو کەیف؛ ۲) تەشقەڵەو گەڕ: (چۆن **بەزمێکمان** پێ‌دەکا!) ف ۱) شادی و بزم؛ ۲) کنایە از بمبول درآوردن.

**بەزمگا:** جێگەی شادیو ئاهەنگ ف بزمگاه.

**بەزوبنیَشت:** جاچکەو پیو کە دەرمانی کوانە ف پیە و سقز کە بر زخم چرکین نهند.

**بەزە:** ۱) دلۆڤانی، روحم، دڵنەرمی؛ ۲) گوناح، هەڵە ف ۱) رَحْم؛ ۲) گُناە.

**بەزەتاو:** پیوی لەسەر ئاگر گەرمکراو بۆ دەرمانی قەڵشتی دەستو پێ ف پیە تفیدە برای ترك دست و پا.

**بەزەرەك:** گیاکەتان ف بَزرَك.

**بەزەك:** نەخۆشی زەردویی ف یَرَقان.

**بەزەوی:** بەزە، روحم ف رَحم.

**بەزەیی:** بزی، بەزە، روحم ف ترحُّم.

**بەزی:** ۱) جۆرێ سابون؛ ۲) بۆڕی خوارد ف ۱) نوعی صابون؛ ۲) شکست خورد.

**بەزین:** ۱) شکست خواردن، لەبەر دژ دانەواندن؛ ۲) ئەسپی زین‌لەپشت؛ ۳) غاردان؛ ۴) باز هاویشتن، پەڕین؛ ۵) سواربونی فەحل لەماین ف ۱) شکست خوردن؛ ۲) اسب زین کردە؛ ۳) دویدن؛ ۴) پریدن؛ ۵) جفتگیری اسب با مادیان.

**بەزێن:** ۱) شکست دەر بەدژ؛ ۲) گاڵتەو گەمەیەکی منالانە ف ۱) هزیمت دهندە؛ ۲) از بازیهای کودکانە.

**بەزیندی سەر:** هەتا ژیا، تا زیندوبو، تاما ف تا زندە بود.

**بەژ:** وشکانی، بەرانبەری ئاوی، بەڕ ف برّ، مقابل دریا.

**بەژا:** هاوتەمەن، هاوعومر ف همسن و سال.

**بەژان:** بەئێش و دەرد ف دردناك.

**بەژڤین:** وردبون لەژێر شتی قورسدا، جیق دەرهاتن ف لِەشُدن.

**بەژك:** چێندراو لەبێ‌ئاو، دێمەکار ف دیمی.

**بەژگداهاتن:** بەگژداچون، شەڕپێ فرۆشتن ف گلاویزشدن.

**بەژن:** قەدوباڵا ف قد و بالا.

**بەژْن:** بەرانبەری بێ‌ژن ف متأهل.

**بەژن باریك:** ناوقەد باریك، بەرانبەری تەنگە ئەستور ف کمر باریك.

**بەژنزراف:** بەژن‌باریك ف کمر باریك.

**بەژن زراو:** بەژن باریك ف کمر باریك.

**بەژی:** دەغڵی دێمی، داهاتی دێمەکار ف دیمی.

**بەس:** ۱) چیترنا؛ ۲) ناوە بۆ ژنان؛ ۳) جێگەی مانگرتن؛ ۴) مانگرتن؛ ۵) زۆر: (**بەستر پێرار**)؛ ۶) بەست: (**هەڵی بەسە، دای بەسە**) ف ۱) بَس؛ ۲) اسم زنانە؛ ۳) بست؛ ۴) اعتصاب؛ ۵) زیاد؛ ۶) بستن.

**بەسات:** ۱) هۆی کردنی کارێك؛ ۲) بەوەختو کات ف ۱) انگیزە و باعث؛ ۲) بەوقت.

**بەسام:** جێ‌ترس، بەعەیبەت، بەهەیبەت، سامدار ف سهمناك.

**بەست:** ۱) جێگەی مانگرتن؛ ۲) گرێو لەمپەرو بەرگر؛ ۳) قەراخ چەمی خیزەلان؛ ۴) کاریتەی دارەڕا؛ ۵) چەمی نیوە وشك، کەم‌ئاو؛ ۶) لافاو گێرەوە، بەند؛ ۷) لێکدراو، پێکەوە نوسێنراو: (دار**بەست**)؛ ۸) پەیمانو کەینو بەین: (بەندو **بەستێك** هەیە بت‌روخێنێ) «هەژار» ف ۱) بَست؛ ۲) مانع؛ ۳) کرانە رودخانە؛ ۴) دیرك؛ ۵) رودخانۀ کم آب؛ ۶) سیل‌بند؛ ۷) بهم چسبیدە؛ ۸) بندوبست.

**بەستران:** ۱) گرێ‌خواردن، گرێ‌دان؛ ۲) بەجادو زاوا لەپەردودا ناهومێد بون ف ۱) بستەشدن؛ ۲) بستن داماد.

**بەستراو:** ۱) بەندکراو، گرێدراو؛ ۲) زاوای بوك ناهومێدکەر کە گانی پێ ناکرێ ف ۱) بستەشُدە؛ ۲) داماد بستە، عنین شُدە.

**بەسترپێر:** بترپێر، بەترپیر، سێ‌ڕۆژ پێش ف روز پیش از پریروز.

**بەسترپێرار:** سێ‌ساڵ پێش، بەترپێرار ف سە سال پیش.

**بەستن:** ۱) گرێ‌دان، شەتەکدان، بەندکردن؛ ۲) سەهۆڵ کردن، مەیینی ماستو...؛ ۳) داخستن: (دەرگاکە **ببەستە**) ف ۱) دربند بستن؛ ۲) بستن یخ و ماست و...؛ ۳) در بستن.

**بەستنەوە:** وەبەستن، قایم کردنی شتێ بەشتێکەوە ف چیزی را بەچیز دیگر بستن.

**بەستو:** ۱) بەیەخ‌بوگ، هەوێن گرتو؛ ۲) کوپەڵە ف ۱) بندآمدە؛ ۲) خُم کوچك.

**بەستۆرە:** چۆمێ کە لەهاوینا وشك‌دەکا ف رودی کە در تابستان می خشکد.

**بەستۆك:** ژنی داوێن‌تەڕی بەدەست هەرکەسەوە ف زنِ بدکارە.

**بەستە:** ۱) ئەوەندە تێرا تەدکا؛ ۲) بەهرە، فایدە: (چی‌تێدا **بەستە** نیە)؛ ۳) دەسك، چەپك، باغە؛ ۴) سەربەند، گۆرانی سوکەڵەو بن‌بزێوکە؛ ۵) سەربە: (فلانکەس **بەستەی** ئاغاژنە)؛ ۶) پەیوەند: (کارەکە **بەستە** بەتۆیە)؛ ۷) چەندشتی دەیەك‌جێ کراو یان پێکەوە بەستراو: (**بەستە**چایی، **بەستە** سیغار، **بەستە**یەکم بۆناردی کەلو پەلی منالان بو) ف ۱) تو را بس است؛ ۲) فایدە؛ ۳) دستۀ گیاە و...؛ ۴) ترانۀ شاد؛

٥) طرفدار؛ ٦) پیوند، مرتبط؛ ٧) بستە سیگار و...

**بەستەر:** بەندکار: (سەرمای ئەمرۆ **بەستەرە**) ف بندآور.

**بەستەزمان:** فەقیرۆکە، بێ‌دەموپل، بەسەزمان ف فقیر و بیچارە.

**بەستەك:** ١) دەستەنوێن؛ ٢) بەستەی گۆرانی ف ١) رختخواب؛ ٢) ترانە.

**بەستەگی:** پەیوەند ف بستگی.

**بەستەلۆك:** زەمینی سەهۆڵاوی ف زمین یخ بستە.

**بەستەڵەك:** بەستەڵۆك ف یخبندان.

**بەستەنی:** ١) بەستەڵۆك؛ ٢) دۆندرمە، بوزە، شیروشەکری سوڵ‌بەستو ف ١) زمین یخ بستە؛ ٢) بستنی.

**بەستەی:** بەستن، گرێدان ف بستن.

**بەستی:** ١) سەهـۆڵ، سوڵ، یەخ؛ ٢) تەختـایی بن ئاوی چەم؛ ٣) کەوی‌ڕاو ف ١) یخ؛ ٢) فرش رودخانە؛ ٣) کبك شکاری.

**بەستیر:** جۆرێ مافورو قاڵی ف نوعی فرش و قالی.

**بەستێن:** رەخی روبـار، دەم‌چەم، گوێ‌چەم، زیخـەڵانی دەم رۆخانە ف کرانۀ رود.

**بەسرپێر:** بەستر پێر ف سە روز پیش.

بەسرپێرار: بەشتر پێرار ف سەسال پیش.

**بەسزمان:** بەلەنگاز، بێچارە، ئارام‌و هێمن ف بیچارە.

**بەسزوان:** بەسزمان ف بیچارە.

**بەسڵەك:** بەستەڵەك ف یخبندان.

**بەسلەمە:** حەیوانی دابەستە، پەرواری ف پرواری.

**بەسن:** بەستن، گرێدان، شەتەکدان ف بَستن.

**بەسە:** بەستە ف نگا: بەستە.

**بەسەراچون:** ١) لەنخافڵ گرتن، بێ‌چاوەنۆڕی گەینە سەریەکێك؛ ٢) نسحەت‌و سەرزەنشت کردن ف ١) غافلگیر کردن؛ ٢) سرزنش نمودن.

**بەسەرادان:** لەنخافڵ بونەمیوانی کەسێ ف سرزدە مهمان شدن.

**بەسەراهاتن:** بەسەراچون ف نگا: بەسەراچون.

**بەسەربردن:** ١) رابواردن، گوزەران کردن؛ ٢) ئەنجامدان، دوایێ‌هێنان ف ١) گذراندن؛ ٢) انجام‌رسانیدن.

**بەسـەرچـون:** ١) نەمـان، بهـوردن؛ ٢) هەڵەکردن، فریوخواردن، ٣) رەحەت‌بون، ئاوی شاوەت هاتنەوە ف ١) گذشتن؛ ٢) اشتباه کردن؛ ٣) خروج منی.

**بەسەرگرتن:** پەیداکردن، توشی گومبوبون ف بازیافتن گم شدە.

**بەسەرگرتنەوە:** بەسەرگرتن ف بازیافتن گم شدە.

**بەسەرهات:** روداو، سەربهورد ف سرگُذشت.

**بەسەرهاتن:** ١) توشی تەنگانەبون؛ ٢) تاڵ‌و سوێری زۆرچێشتن ف ١) پیشامد؛ ٢) سختی بسیار دیدن.

**بەسەرەوەگرتن:** توش‌بونی کەسێ کە گانی ئارەوا دەگەڵ گایراوی دەکا ف کسی را در حال جماع نامشروع دیدن.

**بەسـەرەوەگـەڕان:** ١) سەرپـەرشتی کردن؛ ٢) بریەتی لە زگی مفت لەوەڕاندن ف ١) سرپرستی کردن؛ ٢) مُفت چریدن.

**بەسەرەوەنان:** یەکجێ دەم پیوەنان‌و هەڵقوڕاندن، بێ‌نێوان‌دان فڕکردن ف سرکشیدن.

**بەسەرینی:** لەژیاندا ف در زندگی.

**بەسەزمان:** بەسزمان ف بیچارە.

**بەسەزوان:** بەسەزمان ف بیچارە.

**بەسەڵەك:** بەستەڵەك ف یخبندان.

**بەسیاگ:** داخراو، بەستراو ف بستەشدە.

**بەسیان:** داخران، بەستران ف بستن.

**بەسی:** مانگر ف بست نشستە.

**بەش:** ١) پار، بیش، بەهـرە: (ئەگەر رەمەزانەو ئەگەر شەشەکانە، بەشم هەرژەم‌و دونـانـە) «مەتەڵ»؛ ٢) بەس، تێر: (ئەوتۆزە بەشم ناکا)؛ ٣) لەت‌لەت‌و بڵاوکـردن: (گۆشتـەکـە بەش بەشکەو دابەش‌بکە)؛ ٤) ئاواڵـە، والا؛ ٥) شوم‌و بێ‌فەڕ؛ ٦) ئاژەڵـی نیوچـاوان سپی، توێڵ چەرمـوگ؛ ٧) پاژ، پارچـە: (دنیا لە پینج بەش سێ بەشی ئاوە)؛ ٨) بەرانبـەر، بەگوێرەی: (بـەش بەحاڵی خۆم حەزناکەم بێم)؛ ٩) واش، ئاماڵ ف ١) سهم؛ ٢) کفایت؛ ٣) تکەو پارە کردن؛ ٤) وا، توخالی؛ ٥) شوم؛ ٦) دام پیشانی سفید؛ ٧) جزء، قسمت؛ ٨) بە نسبت خود؛ ٩) متمایل، فام.

**بەشاوەند:** باشڵ‌بۆ شیعر، قافیە ف قافیە.

**بەشبون:** ١) دەم کردنەوەی برین، ئاواڵەبونی زام؛ ٢) پاژبون ف ١) دهن بازکردن زخم؛ ٢) مجزاشدن.

**بەشبەر:** میرات‌گر، کەلەپورگر ف وارث.

**بەشبەش:** ١) لەت‌لەت، کوت‌کوت؛ ٢) دابەش، تەقسیم ف ١) پارەپارە؛ ٢) تقسیم.

**بەشـدار:** ١) خاوەن بەش، شەریك: (لـەماڵدا بەشدارم)؛ ٢) بریتی لە سەگی پاس ف ١) سهیم؛ ٢) کنایە از سگ پاس.

**بەشق:** بەعیشق، بەئـەوین: بۆ سوێنـدان‌و تکـا ئەڵێن: (بـەشقی خوا ماچێکم دەیە) ف بە عشق.

**بەشقا:** ١) بەڵکە؛ ٢) رەنگە، شایەتا ف ١) بلکە؛ ٢) شاید.

**بەشك:** بەگومان: (لێت بەشك‌نیم) ف شك کردە.

**بەشکا:** ١) تەقا، تەقو، جانەوەهاتو، بەشقا؛ ٢) وێدەچێ، شایەتا، دورنیە ف ١) گرفتم آنکە؛ ٢) شاید.

**بەشکانە:** مزگێنی بەرخی تازەزاو کەشوان لە دەشت ئەیهێنێتەوە ف مژدۀ نوزاد گوسفند کە چوپان بەخانە آورد.

**بەشکایە:** بەشکا ف نگا: بەشکا.

**بەشکایەك:** ئەگەرکو، دنیابو ف احیاناً.

**بەشکایەکو:** بەشکایەك ف احیاناً.

**بەشکـردن:** ١) بەخشینـەوەو لەت‌و کوت کردن؛ ٢) تێراکردن: (بەشم دەکا) ف ١) بخشیدن و تقسیم کردن؛ ٢) کفایت کردن.

**بەشکم:** بەشکا، وامان‌دانا ف گیرم.

**بەشکو:** شایەتا، بەشکا ف شاید.

**بەشکۆ:** بازرگانی هاوبەشی، شەریکە، شیرکەت ف شرکتِ سهامی.

**بەشکە:** ١) بەشکا؛ ٢) فەرمانە: بەش بکە: (وەرە لێمان **بەشکە**) ف ١) شاید؛ ٢) *فعل امر*: تقسیم کُن.

**بەشکەر:** کەسێ کە بەشینەوەی بەدەستە ف تقسیم کننده.

**بەشکەم:** بەشکا ف بلکه، خدا کند.

**بەشکی:** بەشکا ف بلکه.

**بەشکێکم:** بەشکا ف بلکه.

**بەشکێکو:** بەشکا ف بلکه.

**بەشگا:** جێگەی دابەش کردنی ئاو، بناوانی ئاوا ف جای تقسیم آب.

**بەشگە:** ١) جێ بەش کردن؛ ٢) شەریکە، شیرکەت ف ١) جای تقسیم کردن؛ ٢) شرکت.

**بەشوُ:** ژنی خاوەن مێرد، بەمێرد ف زنِ شوهردار.

**بەشوّ:** دەقدار، کەتیرە لێدراو ف آهارزده.

**بەشوار:** سابونی زۆر بەکەف ف صابون پُرکف.

**بەشۆدان:** بەمێردان، دانەمێر ف بە شوهردادن دُختر.

**بەشە:** بەش، واش، ئامالْ ف سهم.

**بەشەر:** بنیادەم، مرۆ، عینسان ف انسان، بنی آدم.

**بەشەرت:** ١) لەسەرگرێو، بەمەرج: (**بەشەرتی چەقۆ**)؛ ٢) وەك: (وەرەوە **بەشەرتی جاران**) «وەفایی» ف ١) بەشرط؛ ٢) مانند.

**بەشەرم:** شەرمین، شەرمن، شەرمێون، فەدیکار ف محجوب.

**بەشیر:** ئاژەڵ یان ژنی زۆر شیردار ف شیردە.

**بەشینەوە:** بەخشینەوە، دابەش کردن ف تقسیم و توزیع.

**بەع:** ١) وشەیەکە بۆ گاڵتە دەگەڵ منالْ کردن، باو؛ ٢) مەڕو بزن لەزمانی منالاّنەدا ف ١) کلمەای برای شوخی با کودك؛ ٢) گوسفند بەزبان بچەگانە.

**بەعا:** بزن‌و مەڕ لەزمانی منالاّنەدا، بەع ف گوسفند بەزبان بچّەها.

**بەعاستەم:** بەناستەم ف بسیار کم و اندك.

**بەعجان:** وەرەزبون، جاڕزبون ف خستەشُدن.

**بەعجاندن:** وەرەزکردن، عاجزکردن، جاڕزکردن ف خستەکردن.

**بەعجین:** بەعجان ف نگا: بەعجان.

**بەعر:** دەریا، زەریا، بەحر ف دریا.

**بەعز:** هێند: (**بەعزێ کەس**) ف بعض.

**بەعومر:** پیر، بەسالاّچو ف پیر و مسن.

**بەعەکە:** ئاژەلّی وردە لەزمانی منالاّندا ف گوسفَند و برە بەزبان بچّەها.

**بەعەمر:** بەعومر ف مسن و سالخوردە.

**بەعی:** پێشەکی سەودا: (چەندم **بەعی** دەدەی ئەو ماڵە هی‌تۆ بێ)، عەڕبون ف بیع در معاملە.

**بەعیڤ:** بەهیڤ، بادام، باوی، بایەڤ ف بادام.

**بەعینوان:** شۆخ‌و شەنگ‌و بەفیزو هەوا ف زیبای متکبر و مغرور.

**بەغمە:** نەخۆشی دوشاخە، بوغمە، ملەخڕە ف بیماری خناق.

**بەغیرەت:** ١) ئازاو نەترس؛ ٢) جوامێرو بەناموس، بەخیرەت ف ١) شجاع؛ ٢) غیرتمند.

**بەغیل:** چاوچنۆك، بەئێرەیی، حەسود ف خسیس، حسود.

**بەغیلی:** ئێرەیی، حەسودی ف حسودی.

**بەفالْ:** ماکەرو ماینی نێرخوازو تامەزروی گان ف خر و ستور نرخواه.

**بەفر:** وەور، بەرف، وەفر ف برف.

**بەفرانبار:** هەوەڵ مانگی زستان ف دیماه.

**بەفراو:** ئاوی بەفر ف برف آب.

**بەفربەسەر:** بەفری سەهوّلْ‌بەستوی پەستواو کەپیاو تێ‌ناکەوێ ف برف منجمد کە بر آن روند.

**بەفرخۆرکە:** ١) تەرزەی ورد؛ ٢) مەلێکی بچوکە ف ١) تگرگِ ریز؛ ٢) پرندەای است.

**بەفرماڵ:** پاڕوی بەفرماڵین، بێڵی دارینی بەفر ماشتن، وەروەرە، شەپالۆخ ف پاروی برفروبی.

**بەفرماڵك:** بەفرماڵ ف پاروی برفروبی.

**بەفرەچاڵ:** *چاڵەبەفر*: ١) نواڵەی نزارکە بەفری تاماوەیکی زۆر لێ ناتوێتەوە؛ ٢) ئەو قوڵکەی لەچیا بەفری تێدەکەن‌و دای‌دەپۆشن ف ١) نسارکوە کە برف در آنجا متراکم شود؛ ٢) یخچال طبیعی.

**بەفرەژیلکە:** بەفرەلۆکە، بەفری زۆر دەنك‌ورد ف برفِ دانەریز.

**بەفرەسەر:** بەفربەسەر ف نگا: بەفربەسەر.

**بەفرەلۆ:** بەفرماڵ، وەروەرە، شاپالۆخ ف پاروی برفروبی، داموز.

**بەفرەلۆکە:** بەفرەژیلکە ف برف دانەریز.

**بەفش:** ١) فرچەی مافورماڵین؛ ٢) شەی جۆلاّیی ف ١) فرچۀ فرش؛ ٢) شانۀ جولایی.

**بەفشك:** فرچەی پچوك ف فرچۀ کوچك فرش.

**بەفیز:** بەدەعیە، بادیهەوا، دەمارزل ف پُرمُدَّعیٰ و مُتکبِّر.

**بەفەڕ:** ١) ممبارەك، پیرۆز؛ ٢) بەبەهرە، بەهونەر ف ١) مبارك و فرخندە؛ ٢) بهرەمند.

**بەڤڕا:** پێکەوە، لەگەڵ‌یەکا، بهەڤڕا، وێڕا ف باهم.

**بەڤل:** ١) بێڤل، لوت، کەپۆ؛ ٢) کێویەکی دڕندەیە لەتیرەی پشیلەکێوی؛ ٣) دوژمنی زۆر سەخت ف ١) بینی؛ ٢) درندەایست گربەسان؛ ٣) دشمنی شدید.

**بەق:** ١) بۆق، قورْواق؛ ٢) چاوزەق، چاو دەرپەڕیو؛ ٣) نێرەکەو ف ١) قورباغە؛ ٢) چشم برجستە؛ ٣) کبك نَر.

**بەقا:** وەفا، ئەمەگ: (یار بێ **بەقا** بو) ف وفا.

**بەقازانج:** بەخێر ف سودمند.

**بەقاڵ:** دوکانداری ئازوخە فرۆش ف بقّال.

**بەقبەقو:** گمەگمی کۆتر ف صدای کبوتر.

**بەقبەقۆك:** ئاوی بەبڵقەبڵق ف صدای جوشش آب.

**بەقتاندن:** تەقاندن: (هەسەن کەڤر **بەقتاند**) ف منفجر کردن.

**بەقتین:** تەقین، تەقینەوە ف انفجار.

**بەقلاوە:** پاقلاوە، جۆرێ شیرنی ف باقلوا.

**بەقلە:** بۆقلە ف بوقلمون.

**بەقلەموت:** بۆقلە ف بوقلمون.

**بەقلەوا:** باقلاوە، پاقلاوە ف باقلوا.

**بەقلیسۆك:** بێشەرمو ئابڕو ف بیشرم.
**بەقنگـاخستن:** گوێ پێ نەدان: (کـارەکـەی **بەقنگا خست**) ف پُشت گوش انداختن.
**بەقۆ:** تونگە، لوُلێنەی ئاوخۆرە ف پارچ، تُنگ.
**بەقۆك:** بەقۆ ف پارچ.
**بەقونداخستن:** بەقنگاخستن ف بەتأخیر انداختن.
**بەقەد:** بەرانبەر، لەئەندازەی، بەقەدەر ف باندازهٔ.
**بەقەدەر:** بەقەد ف باندازهٔ.
**بەقـەم:** ١) رەنگێ کە زو کاڵ بێتـەوە؛ ٢) بێ قەولو پەیمان شکێن ف ١) رنگی کە زود بپرد؛ ٢) بدقول و پیمانشکن.
**بەقەو:** بەدەنگی بەرز: (**بەقەو** بانگی کە، **بەقەو** قسەدەکا) ف باصدای بلند.
**بەقەوەت:** خاوەن وزەو هێز، بەتوان و تابشت ف توانا.
**بەقەی:** بەئەندازە، بەقەدەر ف باندازهٔ.
**بەقینـــاچـــون:** غەزرین، یەکپێ لەسـەر شتێ سوُربـون، پێ داگرتن، پێ چەقاندن ف لجاجت و اصرار.
**بەقینداچون:** بەقیناچون ف لجاجت و اصرار.
**بەقینداکەوتن:** بەقیناچون ف لجاجت و اصرار.
**بەقیە:** تەقەڵ لەچەرم ف بخیە.
**بەکار:** کارا، زۆرکارکەر ف کارآ.
**بەکارخواردن:** بەکارهاتن ف بدردخوردن.
**بەکارهاتن:** بکێرهاتن ف بەکارآمدن.
**بەکارهێنان:** دەکارکردن ف بەکار گرفتن.
**بەکام گەیشتن:** کامڕەوابون ف کامروا شدن.
**بەکام گەین:** مراد حاسڵ بون، بەکام گەیشتن ف کامروا شدن.
**بەکاوەخۆ:** هێدی، یەواش، لەسەرخۆ، بەسەبر ف یواشکی.
**بەکربەگی:** جۆرێ بو زوی ڕێ ڕێ ف نوعی شال محلی.
**بەکرۆك:** شوفار، دوزمان، شەیتانی کەر ف سخن‌چین و نمّام.
**بەکرە:** قرقرە، غەرغەرە، مەکارە ف قرقرە.
**بەکسەمەد:** کولێرەی لەشکرچی دەوڵەت ف نوعی گردهٔ سر بازی.
**بەکلکە:** پاشڵ دار، بەدوایی ف دُنبالەدار.
**بەکلکێ:** لاوازی لەمردن ف لاغرمردنی.
**بەکەرزانین:** گاڵتە بەئەقڵی کەسێ کَردن ف کسی را جاهل و احمق دانستن.
**بەکەرەم نەمان:** لەبەهرە کەوتن، بێ کەڵك بون ف ازکار افتادن.
**بەکەرەم هاتن:** بەکارهاتن، جێگەی بەهرە ف بکارآمدن.
**بەکەل:** بەکەلك، بەکار ف کارآ.
**بەکەڵ:** چێڵو گامێشی تامەزرۆی گان ف مادەگاو گشن‌خواه.
**بەکەڵك:** بەبەهرە، بەفایدە ف مُفید.
**بەکەڵك هاتن:** بەکارهاتن ف بەکارآمدن.
**بەکەم گرتن:** قەدر نەزانین ف حقیر شمردن.
**بەکەیف:** ١) سازو تەیار، کۆك و پۆشتە، شادو دڵخۆش؛ ٢) بەئارەزو ف ١) شاد و خوشنود؛ ٢) کامران.
**بەکێش:** ١) بەسەبر و حەوسەڵە؛ ٢) قسەدرێژو قیر سیچمەو درێژدادڕ ف ١) صبور؛ ٢) وراّج.
**بەکێشە:** تەشقەڵەباز، لەبەهانە ف بهانەگیر.
**بەکینە:** رکونیو بوغزلەزگ ف کینەتوز.
**بەگ:** ١) گەورە؛ ٢) لەقەمی ئاغاوات، بێگ ف ١) بزرگ؛ ٢) بیگ.
**بەگا:** زەوی دێراو کەبۆچەندنی رەپستە ئامادەیە ف آبستە، بساردە.
**بەگزادە:** بەچکەبەگ ف بیگزادە.
**بەگژاپەڕین:** ئاوقابون، مل دەبەرمل نان ف گلاویزشدن.
**بەگژا چون:** بەگژاپەڕین ف گلاویزشدن.
**بەگژاهاتن:** بەگژاپەڕین ف گلاویزشدن.
**بەگژداچون:** بەگژاچون ف گلاویزشدن.
**بەگژداهاتن:** بەگژاهاتن ف گلاویزشدن.
**بەگلەیی:** بەگازندە، نازازی ف گلەمَند.
**بەگم:** وشەی ڕێزگرتنە بۆ ئاغاو ئاغاژن ف کلمهٔ احترام بەارباب.
**بەگوان:** گواندار، مانگای زاو ف گاو شیردە.
**بەگون:** گاو نێری نەخەساو ف اختە نشدە.
**بەگوێ:** قسە قبوڵکەرو ئارام، گوێ لەمست ف حرف‌شنو.
**بەگوێ دادان:** بەهێما تێ گەیاندن ف با اشارە فهماندن.
**بەگەن:** پەسند ف پسند.
**بەگیر:** خوڕاگر، بەسەبر و پشو ف صبور، شکیبا.
**بەگیرکەوتن:** وەگیرهاتن، حاسڵ کردن ف گیرآوردن.
**بەگیرگـە:** ١) بەگیر؛ ٢) نەبـەزوکوڵنەدەروەدەستهەڵنـەگر ف ١) صبـور؛ ٢) نستوە.
**بەگیروەستان:** مچورك بەلەش‌دا هاتن ف تیرکشیدن بدن.
**بەگیروێستان:** بەگیروەستان ف تیرکشیدن بدن.
**بەگیرهێنان:** وەگیرهێنان، پەیداکردن ف گیرآوردن.
**بەل:** ١) جوانـی قەدبـــاریك؛ ٢) بزنی گوێ لول؛ ٣) هەڵــواســراو، شوڕەوەبو؛ ٤) شەدار، دەگەڵ وشەی تەڕ دێت: (تەڕو بەلە)؛ ٥) ئاژەڵی گوێ کورت؛ ٦) دەرپەڕیو، بلندتر لەدەوروبەری خۆی؛ ٧) پەلەو لەز؛ ٨) درێژ: (مـل بەل) ف ١) زیبای کمر باریك؛ ٢) بُز گوش پیچیدە؛ ٣) آویزان؛ ٤) نمنـاك، باکلمە «تەڕ» گویند؛ ٥) حیوان گوش کوتاە؛ ٦) برجستە؛ ٧) عجلە؛ ٨) بلند.
**بەڵ:** هێند گەیشتوە نەرم بوە ف بسیار رسیدە و شُل.
**بەلا:** ١) ڕوداوی ناخــۆش؛ ٢) بریەتی لەپیاوی هارو زیرەك؛ ٣) بلاو، پەرژ ف ١) مصیبت؛ ٢) کنایە از آدم آتش‌پارە؛ ٣) پراکندە.
**بەڵا:** ١) مسیبـەت، روداوی ناخۆش، بەلا؛ ٢) با، بلانێ؛ ٣) ئەمما ف ١) مصیبت؛ ٢) بگذار باشد؛ ٣) امّا.
**بەلاتە:** کەلاکی منداری حەیوان ف لاشە مردهٔ حیوان.
**بەلاتیتك:** پەپولە، پەروانە ف پروانە.
**بەلاتینك:** بەلاتیتك، پەپولە ف پروانە.
**بەلاجەوی:** سەیر، سەمەرە، عەجایب ف عجیب.

**بەلاداکـردن:** ١) دەبەر کەمەر چەقاندن؛ ٢) لادانو دەسەر چەقاندنی بسك ف ١) بە کمر بستن؛ ٢) زلف کنار زدن.

**بەلاداکەفتن:** رازان، درێژبونی بێ ئیختیاری ف افتادن بدون اراده.

**بەلاداکەوتن:** بەلاداکەفتن ف افتادن بدون اراده.

**بەلاداهاتن:** بەربونەوە بەعەرزا لەنەچاری ف کنایە از، از حال رفتن.

**بەلازیز:** ١) گوڵێکی سەرەبەهارو عابی رەنگە، پنجەو چەندگوڵ دەردەکا؛ ٢) گوڵـەگەزیزە ف ١) گلی است نوروزی بەرنـگ آسمـانی؛ ٢) قاصدك بهاری.

**بەلاش:** ١) مفت، خۆڕایی، بەبێ نرخ؛ ٢) قسـەی پوچو بن شڕ ف ١) مُفت؛ ٢) یاوە.

**بەلاڤ:** بڵاو، پەرێشان، بەلا ف پریشان و پراکندە.

**بەلاڤۆك:** نوسراو بۆ بڵاوکردنەوە، پەخشە ف نشریّە.

**بەلاگەردان:** قەزاگر، قوربان ف بلاگردان، بلاچین.

**بەلاگێڕ:** فیدا، قەزاو قەدەر گێڕەوە ف بلاگردان.

**بەلاگێڕەوە:** بەلاگێڕ ف نگا: بەلاگێڕ.

**بەلالوك:** ئاڵو باڵو، میوەیەکی سوری ترشی گرۆڤەری چکۆڵەیە ف آلو بالو.

**بەلاڵوك:** بەلالوك ف آلو بالو.

**بەلالیك:** بەلالوك ف آلو بالو.

**بەلالیسك:** گوڵێکی کوێستانە ف گلی است کوهستانی.

**بەلام:** ١) بەفکری من؛ ٢) بەتەنیشت مندا ف ١) بەنظرم؛ ٢) بجانبِ من.

**بەڵام:** بەڵان، ئەمما ف لیکن.

**بەڵامك:** زاربێنی بێچوی ئاژەڵ، بزمك ف دهان‌بند بچۀ شیرخوار حیوان.

**بەڵان:** بەڵام ف لیکن.

**بەلان:** پیاوی تەژەی زەبەلاح ف قوی هیکلِ بدقوارە.

**بەلاوەچون:** لێ نزیك بونەوە ف نزدیك شدن.

**بەلاوەگێڕ:** بەلاگێڕ ف بلاگردان.

**بەلاوەنان:** هەڵپەساردن، نیانەلاوە ف بەگوشەای نهادن.

**بەلای لابەلا:** توش بونی کێشە بەناچاری ف بلای غیرمنتظرە.

**بەل بون:** ١) دەرپـەڕین، زەق، زوپ، هەڵتـۆقین؛ ٢) بەپـەلە ڕۆیشتن، بلەزچون ف ١) برجستەشدن؛ ٢) باشتاب رفتن.

**بەلبەلەگۆش:** بەگوێ، گوێڕادێر ف حرف‌شنو.

**بەلچم:** گەڵاو لکی زۆرناسکی دار ف شاخەهای ریز و نازك درخت.

**بەڵخ:** ١) کەڕو، برش؛ ٢) بڵخ ف ١) کَفَك؛ ٢) دُردی.

**بەڵخە:** یەکانە، نێرەبەراز، بڕەك ف گُراز نر.

**بەلشین:** تێکەوەگلان، پێك هەڵپڕژان ف گلاویزشدن.

**بەڵغ:** بەڵخ ف نگا: بەڵخ.

**بەلغەم:** تفی خەست ف بلغم.

**بەلك:** نەرمەگوێ، جێ‌گوارە ف نرمەگوش.

**بەڵك:** تەقو، شایەتا ف بلکە.

**بەڵکا:** تەقو، شایەتا، بەڵکی ف بلکە.

**بەلکانك:** باڵدارێکە ف پرندەایست.

**بەڵکم:** بەشکم ف شاید.

**بەڵکو:** بەشکو ف نگا: بەشکو.

**بەڵکە:** بەشکە، بەڵکو ف بلکە.

**بەڵگ:** ١) پەڕەی گوڵ؛ ٢) گەڵا، پەلك؛ ٣) پێلو، پەلکی چاو ف ١) گل برگ؛ ٢) برگ؛ ٣) پلك چشم.

**بەلـگ:** لەرزانـە، جۆرێ خشڵی ژنـان کەوەك گەڵاداری دەکـەن ف زیوری است برای زنان.

**بەڵگوبن:** شرتو گوم، تمام وندابون ف گُم‌وگورشدن.

**بەڵگـە:** ١) نیشـان لەگوم بو؛ ٢) دەلیل، سەنەد ف ١) رَدِ گُم شدە؛ ٢) دلیل، سَنَد.

**بەلگێ گۆە :** نەرمەی گوێ ف لالۀ گوش.

**بەللی:** فج، بەلمێ، واتا: هیچوانیە بەگاڵتە پێ کردنەوە ف حرف تمسخر.

**بەلم:** ١) کای برنج وهەرزن؛ ٢) بەهانە ف ١) کاه شالی وارزن؛ ٢) بهانە.

**بەلمەبر:** تفەنگێ لەدواوە باروتو پەڕۆی تێ بخرێ ف تفنگ تەپُر.

**بەلمەڕیشە:** ڕیش پانو پڕمو ف ریش پهن و پرپشت.

**بەلمێ:** بەلێ بەگاڵتەپێکردنەوە ف نگا: بەللی.

**بەلمیت:** مۆم، شەم ف شمع.

**بەلو:** بەڕو، میوەی داربەڕو ف بلوط.

**بەلۆ:** لەقەمی گورگ ف لقب گرگ.

**بەلوجە:** گیایەکە وەك ئەسپوێن کەف دەکا ف گیاهی است کە مانند اشنان کف کند.

**بەلوچە:** بەرولەی ئامور ف از ابزار خیش.

**بەلۆڤاژی:** بەراوەژی ف وارونە.

**بەلۆك:** زمان شڕ، تێدا نەوەستاو ف دهن لق.

**بەلۆکە:** میتکە، قیتکە، چوچەڵە، نێوەر، چیلکە ف چوچولە.

**بەلوەشێن:** نەخۆشی گران ف بیماری سخت.

**بەلە:** بەلۆکە ف چوچولە.

**بەلەباریك:** قەدزراو ف کمر باریك.

**بەلەباریکە:** بەلەباریك ف کمر باریك.

**بەلـەبـاقـە:** نەخۆشیەکی بزنە: (بزنو مەڕ روت بون وەك سورەساقە / یەك دانو دەیکوشت یەك **بەلەباقە**) «سەیف» ف نوعی بیماری بز.

**بەلەبڵ:** چەقەسرو، چەنەباز، زۆربڵێ، فرەوێژ ف وراج، پرگو.

**بەلەپا:** زۆر خۆشڕۆ ف بادپا.

**بەلـەچـەك:** ١) تاسمە، کولەکەی وشك کراو بۆ زستان؛ ٢) هەڵواسراو، بەتـەکەتەك؛ ٣) کەلەبچە، دەست بەندی پەندی ف ١) کدوی خشك کردە؛ ٢) آویزان؛ ٣) دستبندِ زندانی.

**بەڵەد:** شارەزا، ڕێزان، ڕێنوێن ف بَلَد، راهنما.

**بەڵەدی:** شارەزایی ف بَلَدی.

**بەلەدی:** تروسکەی بروسکەی عاسمان ف درخشش برق.

**بەلەدیە:** شارەوانی ف شهر بانی.

**به‌له‌زمانه:** زمانه‌چکۆڵه‌[ف] زبانِ کوچك.
**به‌له‌زوانه:** به‌له‌زمانه[ف] زبانِ کوچك.
**به‌له‌زه‌ت:** خۆش چێژ، خۆشتام[ف] لذیذ.
**به‌له‌سه:** په‌له‌، له‌ز، وه‌په‌له‌ که‌وتو، په‌ل[ف] شتابان.
**به‌له‌سه‌بون:** ١) وه‌په‌له‌ که‌وتن؛ ٢) دانه‌ ده‌شت‌و غه‌زرین[ف] ١) شتاب کردن؛ ٢) آوارهٔ کوه و صحرا شدن.
**به‌له‌شوانه:** گیایه‌کی کوێستانه‌[ف] گیاهی کوهستانی.
**به‌له‌شین:** له‌قه‌می گورگ[ف] از القابِ گرگ.
**به‌له‌فیره:** زگ‌چون‌و ره‌وان‌بونی ئاژاڵ[ف] اِسهال حیوانی.
**به‌له فیرێ:** به‌له‌فیره‌[ف] اِسهال حیوانی.
**به‌له‌قاژی:** به‌راوه‌ژو، واژی، ئاوه‌ژو[ف] واژگون.
**به‌لـه‌ك:** ١) گۆشتی نێوان ئه‌ژنـۆو پاژنـه‌، ساق‌پا؛ ٢) مێکوك، گیایه‌که‌ ره‌گ‌زه‌ردو شیرن‌تاڵ؛ ٣) ئاژه‌ڵـێ که‌ په‌ڵـێکـی سپـی‌بێ؛ ٤) ئه‌یاغ، چروك بێ‌نرخ[ف] ١) ساق پا؛ ٢) گیاه شیرین بیان؛ ٣) دامی که‌ یك پایش سفید باشد؛ ٤) بنجل، نامرغوب.
**به‌ڵه‌ك:** دوره‌نگ، بازگ، بازو[ف] دورنگ.
**به‌له‌ك بردێن:** ره‌نگاوره‌نگ[ف] رنگارنگ.
**به‌له‌ك بردێنی:** ره‌نگین کردن، ره‌نگاندن[ف] رنگ کردن.
**به‌له‌ك‌پێچ:** دۆلاغ، ساق‌پێچ[ف] ساق‌پیچ.
**به‌ڵـه‌کی:** ١) دوره‌نگی؛ ٢) نه‌خـۆشیه‌کـه‌ پێست په‌ڵاوی ده‌کـا[ف] ١) دورنگی؛ ٢) بَرَص پوست.
**به‌ڵه‌گ:** به‌ڵه‌د، شاره‌زا[ف] بَلَد.
**به‌گوشك:** نه‌رمه‌ی گوێ[ف] لالهٔ گوش.
**به‌لـه‌گه‌ور:** ١) له‌قه‌می گورگ؛ ٢) نه‌هاتی، نه‌گبه‌تی[ف] ١) از القابِ گُرگ؛ ٢) نکبت.
**به‌ڵه‌ڵ:** به‌ڵه‌د، شاره‌زا[ف] بَلَد.
**به‌له‌م:** ١) قایغ، قه‌یاغ، لۆتکه‌؛ ٢) ده‌فری گه‌وره‌ بۆ چێشتی گرار[ف] ١) قایق؛ ٢) بشقابِ بزرگِ پلو.
به‌له‌ندیر: شه‌کی به‌ربه‌ران، به‌ردیل[ف] گوسفندِ سه‌بهار دیده.
**به‌له‌نگاز:** به‌سته‌زمان، بێچاره‌، نه‌دار[ف] بیچاره‌، بینوا.
**به‌ڵێ:** به‌رێ، ئا: (حه‌سه‌ن! **به‌ڵێ**. چوی؟ **به‌ڵێ**)[ف] بَلی، آری.
**به‌لی:** به‌ڵێ[ف] بلی.
**به‌ڵیاندن:** رازی کردن، قانع کردن[ف] راضی کردن.
**به‌ڵێن:** قه‌ول، په‌یمان، سۆز[ف] عهد و پیمان.
**به‌ڵێن‌دان:** قه‌ول‌دان، سۆزدان[ف] قول‌دادن.
**به‌م:** ١) به‌ئه‌م نزیکه‌؛ ٢) ئاینده‌ی بردن: (ئه‌ی به‌م)؛ ٣) ده‌نگی قه‌به‌وزبر [ف] ١) بهاین؛ ٢) پسوند به‌معنیِ می‌برم؛ ٣) صدای کلفت.
**به‌مبوڵه:** فێڵباز، ده‌سبڕ، حیله‌باز[ف] ناروزن.
**به‌مبون:** زبر و درشت‌بون[ف] زبری.
**به‌مو:** به‌کوڵکه‌، مودار[ف] پَشمالو.
**به‌مێر:** ژنی‌شودار[ف] شوهردار.
**به‌مێرد:** به‌مێر [ف] شوهردار.
**به‌مێرددان:** به‌شودان[ف] شوهردادن.
**به‌ن:** ١) هه‌ودای له‌خوری‌و مو؛ ٢) به‌ند، هه‌رچی شتی پێ‌ده‌به‌ستن؛ ٣) گزی‌و فێڵ؛ ٤) دارقـه‌زوان؛ ٥) ده‌وروبـه‌ری ئاوایی؛ ٦) «گیابه‌ند»: گیایه‌کی کوێستانیه‌؛ ٧) وێستاو، مانه‌وه‌[ف] ١) نخ؛ ٢) بند؛ ٣) نیرنگ؛ ٤) درخت بنه؛ ٥) حریم ده؛ ٦) گیاهی است؛ ٧) راکد.
**بهن:** ١) بۆ، بۆن؛ ٢) نه‌فه‌س، هه‌ناسه‌، بین[ف] ١) بو؛ ٢) نفس.
**به‌نا:** ١) وه‌ستای خانو؛ ٢) گیایه‌که‌[ف] ١) بنّا؛ ٢) گیاهی است.
**به‌ناز:** ئه‌وی نازده‌کا، نازدار[ف] نازنین.
**به‌ناشوانه:** گیایه‌که‌ بۆن‌خۆش، وشکی ده‌که‌ن‌و ره‌گه‌ڵ ماستی ده‌خه‌ن [ف] گیاهی است با ماست خورند.
**به‌ناف:** داری بناو[ف] درخت زبان گنجشك.
**به‌نـاڤ:** ١) نیۆپـڕ، پته‌و؛ ٢) خاوه‌ن ناو، به‌ناوبانگ[ف] ١) مُحکم؛ ٢) مشهور، نامی.
**به‌نان:** هه‌ڕه‌ت‌و ده‌می به‌ستن: (**یه‌خ‌به‌نان، ڕێ‌به‌نان**)[ف] عنفوان.
**به‌ناو:** به‌ناوبانگ[ف] مشهور.
**به‌ناواچون:** به‌ره‌وپیری چون، نیوه‌پیر بون[ف] مُسن شدن.
**به‌نایی:** کاری خانو دروست کردن، وه‌ستایه‌تی قوڕه‌کاری[ف] بنّایی.
**به‌نبڕ:** تیخ، هه‌رچی ده‌برێ: (**به‌نبڕم ددانه**)[ف] تیغ عموماً.
**به‌نبون:** مانه‌وه‌، نه‌ڕۆیشتن[ف] ماندگار شدن.
**بهن‌ته‌نگ:** بێ‌حه‌وسه‌ڵه‌، که‌م‌پشو، که‌سێ زو هه‌ڵده‌چی‌و تۆڕه‌ ده‌بێ[ف] کم‌حوصله و زودرنج.
**به‌نجگه‌ر:** بریه‌تی له‌ فرزه‌ند، زۆر خۆشه‌ویست[ف] بند جگر، کنایه از فرزند.
**به‌نـد:** ١) حه‌پس‌و زینـدان؛ ٢) گه‌ی قامکـان؛ ٣) جومگه‌ ده‌ست؛ ٤) پێوه‌نـدی زینـدانی؛ ٥) مانـه‌وه‌؛ ٦) حیله‌وگزی؛ ٧) جۆی گه‌وره‌و هه‌ڵـبـه‌سـتـراو؛ ٨) به‌رگیره‌ی لافـاو، سه‌د؛ ٩) گیر و گرفت؛ ١٠) پارچه‌یه‌ك له‌قه‌سیده‌ی شیعر؛ ١١) کورته‌گۆرانی؛ ١٢) به‌سته‌کاغه‌ز؛ ١٣) قه‌ده‌غه‌، قاخه‌؛ ١٤) بڵندایی له‌ته‌ختایی‌دا؛ ١٥) پێنجه‌م حه‌وته‌ی زستان؛ ١٦) وه‌خت، جه‌نگه‌: (سه‌رو به‌ند)؛ ١٧) ساڵی جوت‌کردنی گا: (ئـه‌م‌گایه‌ دو به‌نـده‌، ئه‌مـه‌یان سێ به‌نده‌)[ف] ١) زندان؛ ٢) بند انگشت؛ ٣) مچ دست؛ ٤) کندهٔ پای زندانی؛ ٥) ماندگارشدن؛ ٦) نیرنگ؛ ٧) جوی بزرگ؛ ٨) سدّ؛ ٩) گرفتاری؛ ١٠) قسمتی از یك قصیده؛ ١١) ترانهٔ کوتاه؛ ١٢) بستهٔ کاغذ؛ ١٣) قدغن؛ ١٤) بلندی در یك دشت؛ ١٥) پنجمین هفتـهٔ زمستـان؛ ١٦) هنگام؛ ١٧) تعداد سالهایی که گاو شخم زده است.
**به‌نـدان:** ١) به‌نـان: (ڕێ‌به‌نـدان)؛ ٢) تێ‌هه‌ڵسـونی به‌کـۆمـه‌ڵ: (**خه‌نه‌به‌ندان**)[ف] ١) بستن؛ ٢) حنا مالیدن دسته‌جمعی.
**به‌ندبون:** ١) مانه‌وه‌، نه‌ڕۆیشتن؛ ٢) چه‌سپین، نوسان: (**به‌چرێش به‌ندم کرد**)[ف] ١) ماندگار شدن؛ ٢) چسبیدن.
**به‌نـدك:** ١) تا، هه‌ودا؛ ٢) ڕێسـراوی خوری؛ ٣) گه‌ردانه‌؛ ٤) گیایه‌که‌ ده‌شیرێو لۆرکی ده‌کـه‌ن، مه‌نـدۆك، مه‌نـدێ؛ ٥) پێچی شۆڕه‌وه‌بـو، کراوات، بۆینباخ؛ ٦) بێخی گیا[ف] ١) فاصله؛ ٢) ریسیده از پشم؛ ٣)

گردن‌بند؛ ۴) گیاهی است خوردنی؛ ۵) کراوات؛ ۶) پیاز گیاه.
**بەندرو:** گشتەکەبەن بۆ جواڵدرون ف نخ مخصوص جوالدوزی.
**بەندڵ:** بەندی دڵ، بریەتی لە خۆشەویستو ئازیز ف کنایە از محبوب.
**بەندوباو:** دەنگ داکەوتن، شایعە، ئیشاعە ف شایعە.
**بەندۆخین:** بەندەخوێن، بەندێخون ف بند شلوار.
**بەنــدۆك:** ١) گیایەکی کوێستـــانیە؛ ٢) بەنی ژێرچـــەنـــە کە کڵاوی پێ‌رادەگرن ف ١) گیاهی است کوهستانی؛ ٢) رشتە گردن‌بند.
**بەندۆکە:** بەندۆك ف نگا: بەندۆك.
**بەندۆڵ:** فەنەری سەعات، زەنبەلەك ف پاندولِ ساعت.
**بەندە:** کۆیلە، بەنە، بەنی ف بردە، بندە.
**بەندەخوێن:** بەندۆخین ف بند شلوار.
**بەنـدەر:** ١) ئەسکـەلـە، لەنگـەرگا؛ ٢) شاری سەر دەریا؛ ٣) بریکار، وەکیل: (شابەندەر) ف ١) بندر؛ ٢) شهر بندری؛ ٣) وکیل.
**بەندەقە:** تەوەرە، ئاسنی بن‌بستی ئاش ف قطبِ آسیا.
**بەندەکە:** باقەبێن، باغەبێن ف بستەبند گیاە.
**بەندەن:** ١) چیا، کێو، کەژ؛ ٢) لەش، بەدەن: (هەمو بەندەنم دێشێ) ف ١) کوە؛ ٢) بدن.
**بەندەوار:** ئەویندار ف عاشق.
**بەندی:** زیندانی، حەفسی، گراو ف زندانی.
**بەندی جگەر:** بەنجگەر ف جگرگوشە.
**بەندیخانە:** زیندان، حەفس، گرتوخانە ف زندان.
**بەندێخون:** بەندۆخین ف بند شلوار.
**بەندی‌دڵ:** بەندڵ ف دلبند.
**بەندێر:** ئاڵا، بەیداخ ف پرچم.
**بەندی‌وان:** زیندان‌وان ف زندانبان.
**بهنژین:** پشمین، پژمین ف عطسەکردن.
**بەن‌سامۆتە:** بەندی پاشکۆ، دوبەنی هۆنراو بەپشت زینەوە کە پاشکۆی پێ دادەبەستن ف فتراك.
**بەن‌سامۆرتە:** بەن‌سامۆتە ف فتراك.
**بەنك:** ١) ریسی خوری؛ ٢) دارقەزوان، دارەبەن؛ ٣) بەندۆکەی ژێرچەنە ف ١) ریسیدە از پشم؛ ٢) درخت بنە؛ ٣) بند کوتاە زیر چانە.
**بەنکەشی:** پڕکردنەوەی کەلێنە خشتی دیواربەگێچو... ف بندکشی با گچ.
**بەنکـەڵەوە:** ئەوبەنەی چەڵەمەی ملی گای پێ دەبەستن ف چنبرەبند گردن گاو.
**بەنکەوانە:** گوریسی ئەم‌سەر ئەوسەری شەغرە ف طناب بستن گیاە.
**بەنکێشی:** بەنکەشی ف بندکشی ساختمان.
**بەنـگ:** ١) حەشیشـە، گیایەکە دەیکێشن‌و خەیاڵ دەیان‌گرێ: (ئێژی بەنگت کێشاوە)؛ ٢) گەڵای دار، پەلك؛ ٣) نیشانە، بەڵگە؛ ۴) وەستاو: (لێرە بەنگ بوە)؛ ۵) وەخت، کات ف ١) بَنگ؛ ٢) برگ؛ ٣) سَنَد؛ ۴) ماندگار؛ ۵) وقت.
**بەنگا:** شێلەگە، جێگەی جۆگە شکاندن بۆ ئاوداشتن ف شکافگاە جوی بهنگام آبیاری.
**بەنگبون:** مانەوە، گیرخواردن، قەتیس‌مان ف دچارشدن.
**بەنگ‌رێ:** باس کڵاو، کڵاوبن ف برگ و بیخ ریواس.
**بەنگڵە:** گیایەکە لەمێرگان دەڕوێ ف گیاهی است.
**بەنگڵەژیلە:** بەنگڵە ف گیاهی است.
**بەنگوباو:** بەندوباو ف شایعات.
**بەنگۆکە:** بەندۆکە ف نگا: بەندۆکە.
**بەنگە:** بەنگا ف نگا: بەنگا.
**بەنگەڵ:** بەنگڵە ف نگا: بەنگڵە.
**بەنگەڵە:** خانوی لەتەنەکە ف خانۀ ساختە شدە از پیت.
**بەنگی:** ١) بەنگ کێش؛ ٢) حەپسی، بەندی ف ١) بنگی؛ ٢) زندانی.
**بەنگین:** ناوە بۆپیاو ف از اسامی مردانە.
**بەننا:** وەستای خانو، بەنا ف بنّا.
**بەنوکە:** گیایەکە لەئاوا دەڕوێ ف گیاهی است.
**بەنوڵە:** بەنوکە ف نگا: بەنوکە.
**بەنـە:** بەنـدە، کۆیلە: (ئەمەنان نەبو، تۆدات وە بەنە / وەرەنجی شان‌و وەزۆری چەنە) ف بندە، بردە.
**بەنەخون:** بەندۆخین ف بند شلوار.
**بەنەر:** بەندەر ف بندر.
**بەنەری:** جۆرێ جسنی کەری خێرا ف نژادی از الاغ.
**بەنەن:** چیاو قەدی چیا، بەندەن ف کوە و کمر.
**بەنی:** ١) باسـوخ، سجـوق؛ ٢) لەرزانـە، خشڵێکی ژنـانە؛ ٣) بەندە، کۆیلە، خولام؛ ۴) گرتـو، حەفسی، بەنـدی ف ١) باسلق؛ ٢) زیو، آویزان؛ ٣) بندە؛ ۴) زندانی.
**بەنیر:** بەنکەڵەوە ف چنبر بند گردن گاو.
**بەنیشت:** بنێشت ف سقز.
**بەو:** ١) وەرە، بێ: (بـەو، بەو، بەو، بەو، بەو، خانمە خاسەکەم / پابنێ وەبان چاوە ڕاسەکەم)؛ ٢) ناوی حەپەی سەگ؛ ٣) وەو، بەئەو: (چی وتت بەوم گوت) ف ١) بیا؛ ٢) پارس سگ؛ ٣) بەاو.
**بەواسیر:** مایە سیری، نەخۆشی زگ‌چون بەخوێنەوە ف بواسیر.
**بەور:** ١) دڕندەیەکی پیاوخۆری بەسامە؛ ٢) جۆرێ کوانی زۆر بەژانە؛ ٣) بەفر ف ١) بَبر؛ ٢) نوعی ورم دردناك؛ ٣) برف.
**بەورە:** دڵقایم، خوڕاگر ف با دل و جرأت و شکیبا.
**بەورەشینکە:** کوانی بەور کەزۆر بەژانە ف ورمی است بسیار دردناك.
**بەورەشینە:** بەورەشینکە ف نگا: بەورەشینکە.
**بەوری‌بەیان:** دڕندەیەکی زەرندە، بەور ف بَبر.
**بەوز:** ١) داری بۆز، بوز، دارمێشولە؛ ٢) سپی‌ورەش تێکەڵاو، بۆز ف ١) درخت پشە؛ ٢) ابلَق.
**بەوش:** ١) شەی نێوانـی کری جاجمو... بۆ پەستـــاوتنی پۆ؛ ٢) نێوان ئانیشك‌و شان، قۆڵ ف ١) شانۀ بافندگی؛ ٢) بازو.
**بەون:** ١) زەوی بۆرە؛ ٢) بۆن، بێن، بۆ، بێهن ف ١) زمین بایر؛ ٢) بو.
**بەوەج:** پیاوی بەنرخ‌و قەدر: (زۆرپیاوێکی بەوەجە) ف ارجمند.

**بەوەرز:** دڕندێکە لەتیرەی پشیلەکێوی و لە پشیلە چکۆڵەترە ف درندە ای است گربەسان.

**بەوەسیری:** مایەسیری، بەواسیر ف بواسیر.

**بەهـ:** ١) وشـەی پەسنـدکردن: (بەهـ ! چەند جوانە؟)، پەخ؛ ٢) وشەی نارەزایەتی: (بەهـ ! لەو قسەقۆڕەت) ف ١) حرف تعریف؛ ٢) حرف تنفر.

**بەها:** ١) نرخ، بوها، بەهێ؛ ٢) گرانقیمەت ف ١) نرخ؛ ٢) گران قیمت.

**بەهار:** لە نەورۆزەوە سێ مانگ، بوهار، بوار، وەهار ف بهار.

**بەهـــارات:** ئیسیوەت و ئەدوا، دەرمـــانی چێشت خۆشکـــەر، ئالآت و زەردەچێوە ف ادویەجات.

**بەهاران:** دەکرێ بەهاردا، لەچاخی بەهارا ف بهاران.

**بەهاربەند:** تەویلەی سەردانەپۆشراو کەپاش زستان یەکسمی تێدەکەن ف طویلهٔ سرگُشادە.

**بەهـارستـان:** جەنگـەو هەرەتی بەهـار: (هەمودنیا بەهارستانە ئیمڕۆ) «کوردی» ف هنگامهٔ بهار.

**بەهـارو:** گەنمـەبەهارە: (وەك ئاردی بەهاروواپە هەموشتی لێ دروست دەبێ) ف بهارە.

**بەهارە:** ١) بەهارو؛ ٢) پەیدابولە بەهارا: (ئەم بەرخە بەهارەیە، توتنەکەم بەهارەیە) ف ١) بهارە؛ ٢) در بهار پدید آمده.

**بەهارەزێ:** بەرخێ لەبەهارا زابێ ف برّه ای کە در بهار بەدنیا آمده است.

**بەهارەکێڵ:** شوی زەوی لەبەهارا ف شخم بهاری.

**بەهارەوار:** چادرهەڵدان لەنزیك گوند بەرلە چونی زۆزان ف چادرزدن در حریم دە قبل از رفتن بە ییلاق.

**بەهاری:** هەرچی سەر بە بەهارە ف بهاری.

**بەهـاریێ:** لەکـرێ بەهـاردا، بۆ رابردەو ئایندە: (بەهاریێ چوم، بەهاریێ دەچم) ف در بهار.

**بەهانە:** بیانو، پەڵپ، کرّو، بیانگ ف بهانە.

**بەهبەهـ:** وشەی پەسند کردن: (بەهبەهـ ! لەو خۆشیە) ف بەبە.

**بەهتین:** توانەوە، تاوانەوە، حەلین ف گداختن.

**بەهر:** پار، بێش، پشك، بەحر، بەش ف قسمت.

**بەهرك:** گۆڵ، دەریاچە ف دریاچە.

**بەهركردن:** دابەشكردن ف تقسیم كردن.

**بەهرە:** ١) داهات، قازانج، فایدە؛ ٢) نیعمەت: (بەهرەی خودا زۆرە) ف ١) بهرە؛ ٢) نعمت.

**بەهرەدار:** بەقازانج، بەفایدە ف مُفید.

**بەهرەمە:** مەتکەو، دارکونکەری دارتاشان ف مَته.

**بەهرەمەند:** خاوەن فایدە ف بهرەمند.

**بەهرێز:** پارێز، تەکینەوە لەهێندێ خواردن کە حەکیم دەڵێ ف پرهیز.

**بەهسك:** مێشولە، پێشولە ف پَشه.

**بەهلنگی:** نازبالشتی بەرپێ ف بالش.

**بهـونە:** فەرمانی هۆنینەوە: (ئەم موروانە بهونە، ئەم گوریسە بهونە) ف *فعل امر*: بەرشتە بکش.

**بەهەجاندن:** قەڵس کردن، تورەکردن ف بخشم آوردن.

**بەهەجوك:** مرۆی هەمیشە سڵ و تورە ف آدم همیشە عصبانی.

**بەهەشت:** باغاتی خودا لەودنیا ف بهشت.

**بەهەشتی:** ١) دیندار و پیاوی خوا؛ ٢) کەیبانوی ماڵ لەزاراوەی فەقی‌دا کەدەچنە دەقنە ف ١) مَرد خدا؛ ٢) زن خانەدار در اصطلاح طلبەها.

**بەهێ:** ١) میوەی بەی، بێ، هێوە؛ ٢) نرخ، بەها، بایی ف ١) میوهٔ بە؛ ٢) نرخ.

**بەهیڤ:** بادام، باوی ف بادام.

**بەهیڤ ئاژنگ:** بادامی تاڵ، باویەتاڵە ف بادام تلخ.

**بەی:** ١) میوەی داربەهێ؛ ٢) بەئەم: (بەی تەرزە) ف ١) میوهٔ بە؛ ٢) بە این.

**بهێ:** نرخ، بەها ف نرخ.

**بەیات:** ١) خۆراکێ شەو مابتـەوە، پاتە، شەوباتە، بەزێرە؛ ٢) هۆزێکە کوردیش و تورکیش؛ ٣) هەوایەکی گۆرانی‌وقـام ف ١) خوراك شب ماندە؛ ٢) عشیرتی است؛ ٣) آهنگی است.

**بەیاتە:** رۆنی هەڵکزاوی بەزودوگ ف روغن پیە و دُنبە.

**بەیاخ:** ئالآ، بەیداخ ف پرچم.

**بەیاخدار:** ١) ئالآچی؛ ٢) برێتی لەژنی بێ‌حەیاو هار ف ١) پرچمدار؛ ٢) کنایە از زن بی حیا.

**بەیاد کردن:** وەبیرهاتنەوەو باسکردن ف یادکردن.

**بەیادی کردن:** بێ‌ئوقرەیی لەدوری ئازیز ف بی‌تابی از هجران.

**بەیار:** زەمینی نەکێڵراو، بوُرە ف زمین بایر.

**بەیاز:** ١) بەیار؛ ٢) دەفتەری شیعر و بیرەوەری ف ١) زمین بایر؛ ٢) دفتر اشعار.

**بەیازە:** لکی سەرقرتێنراو، داری یەختەکراو ف شاخهٔ هرس شدە.

**بەیان:** ١) سپێدە، شەوەکی، سوزو؛ ٢) ئاشکرا: (بۆمان بەیان کە) ف ١) بامداد؛ ٢) آشکار.

**بەیانە:** بەی، بەهێ، بێ ف میوهٔ بە.

**بەیانەکی:** بەرەبەیان، شەوەکی، سپێدەزو ف سپیدەدَم.

**بەیانی:** ١) سپێدە، شەوەکی؛ ٢) رۆژی پاشی، سبـەی: (بەیانی نیوەڕۆ ئەتبینمەوە) ف ١) سپیدەدم؛ ٢) فردا.

**بەیبان:** ناوی گوندێکە لەکوردستان ف نام روستائی در کُردستان.

**بەیبون:** گیایەکو گوڵێکی بۆخۆشە ف گیاهی است مشهور.

**بەیبونە:** گوڵە بابونە ف گُل بابونە.

**بەیت:** ١) چیرۆکی بەشیعر: (بەیتی دمدمی بەسۆرانی عەلی بەردەشانی داناوە)؛ ٢) هەوای گۆرانی: (بە بەیت و بالۆرە بەیەکتریان هەڵگوت) ف ١) داستان منظوم؛ ٢) آهنگ.

**بهیتن:** ١) تاوانـــدنـــەوە، حەلانـدن؛ ٢) تاوانـەوە، حەلین، بهتین؛ ٣) دەگوێ‌گرتن، بیستن ف ١) گُداختن؛ ٢) آب‌شدن؛ ٣) شنیدن.

**بەیتەشە:** گێلۆکە، بەسەزمان، کەمزان ف هالو، دیرفَهم.

**بەیجە:** نەردیوان، پەیژە، سلەم ف نردبام.

**بەیچەڵ:** نەزۆك، ستێور ف نازا.

**بەیداخ:** ئاڵا، بەیاخ، پارچەی بەدرۆشمی گەل‌و قەوم، عالا ف پرچم.
**بەیداخدار:** ئاڵاهەڵگر، بەیاخدار ف پرچمدار.
**بەیدەس:** ۱) سڵ، قوشقی، ئەسپ یا ماینێك كە ڕام نەبوەو ناگیری؛ ۲) بەردەست، تەسلیم، ملدەر؛ ۳) دەسو پێ سپی‌و كارلەدەس نەهاتو ف ۱) رموك؛ ۲) تسلیم و سپر انداخته؛ ۳) دستپاچه.
**بەیدەست:** بەیدەس ف نگا: بەیدەس.
**بەیدێ:** وەرن، بێن ف بیایید.
**بەیرەم:** لۆسە، ملغە، باریە، نوێڵ ف اهرم.
**بهیستن:** بیسن، شنەفتن، ژنەوتن ف شنیدن.
**بەیلوت:** جۆرێ هەڵپەڕكێ ف نوعی رقص گروهی.
**بەین:** ۱) نێوان، ماعبەین؛ ۲) دۆستایەتی، ئاشنایەتی؛ ۳) وەختێكی زۆر ف ۱) میانه؛ ۲) دوستی؛ ۳) مدّتی زیاد.
**بەینەت:** وەفا، ئەمەگ ف وَفا.
**بەینەت‌دار:** بەوەفا، بەئەمەگ ف وفادار.
**بەیەكاچون:** ۱) دەگژیەكڕا چون؛ ۲) چونە ناویەكتر، تێك بەزین ف ۱) باهم گلاویزشدن؛ ۲) درهم شدن، درهم رفتن.
**بەیەكـــادان:** ۱) شاڵاو بۆســەر یەكـــتـــر بـــردن: (ئـــێران‌و عیراق **بەیەكـــائەدەن**)؛ ۲) تێكەڵ كردن: (ئاردوڕۆنەكە **بەیەكادە**) ف ۱) بر یكدیگر هجوم بردن؛ ۲) قاتی كردن.
**بەیەك گەیشتن:** پێك گەیین، توشی‌یەك بون ف وصال، بەهم رسیدن.
**بەیەوە:** باڕن، بەفرێ كەبا ڕنیویەو دەقوڵكەی پەستاوتوە ف برف جمع شده بەوسیلهٔ باد در كوهستان.
**بێ:** ۱) ناوی دوهـەم پیتی ئەلفـو بێتكە؛ ۲) وەرە؛ ۳) با، جولاّنی‌با؛ ۴) بەجگە: (**بێ تۆ** دنیا كاولە)؛ ۵) میوەی داری بەی؛ ۶) لەپێش وشەوە نەبـون دەگەینێ: (**بێ‌پارەم**)؛ ۷) پاش وشە: بوێ، ببێ، مانا دەدات: (ئـەگەر وابێ دەبێ پیاوێ چابێ)؛ ۸) بوُ ف ۱) حرف دوم از حروف الفبا؛ ۲) بیا؛ ۳) باد؛ ۴) بی؛ ۵) میوهٔ درخت به؛ ۶) پیشوند نداری؛ ۷) باشد؛ ۸) بود.
**بی:** ۱) دارە بی؛ ۲) بێوەژن، ژنی شو مردو ف ۱) بید؛ ۲) بیوەزن.
**بیابان:** ۱) دەشتی چۆڵ؛ ۲) بورانەوە: (دڵم **بیابان** بوە دەبوُڕێتەوە) ف ۱) بیابان؛ ۲) از هوش رفتن.
**بێ‌ئابڕو:** ئابڕونەدار، بێشەرم‌و حەیا ف بی آبرو.
**بێ‌ئارام:** دانەسەكناو، بێ‌ئۆقرە ف ناآرام.
**بێ‌ئاگا:** بێخەبەر، های لەهیچ نا ف ناآگاه.
**بیام:** بوبام، بوایتم ف بودمی.
**بیانك:** بەهانە ف بهانه.
**بیانگ:** بەهانە ف بهانه.
**بیانو:** بیانگ ف بهانه.
**بیانی:** ۱) بەهانە؛ ۲) بێگانە، غەوارە ف ۱) بهانه؛ ۲) بیگانه.
**بیاوان:** بیابان، چۆل ف بیابان.
**بێ‌ئاوڕو:** بێ‌ئابڕو ف بی شرم.
**بێ‌ئاوەز:** بێ‌عەقڵ، هەقمەق ف نابخرد.

**بێ‌ئۆرت:** بێ‌ئیحتوبار، نەجێ‌باوەڕ ف بی اعتبار.
**بێ‌ئۆقرە:** بێ‌ئارام ف بی آرام.
**بێ‌ئۆل:** بێدین، بێ‌ئاین، كافر ف بی‌دین، كافر.
**بێ‌ئەمەگ:** بێ‌بەینەت ف بی‌وفا.
**بێ‌ئەنوا:** بێ جێگەی حەسانەوە، بێ‌پەنا ف بینوا.
**بیبا:** ۱) هەیبوایە، بوایتی؛ ۲) بیوات ف ۱) اگر داشت؛ ۲) ببردش.
**بێبار:** ۱) وازوازی، هەردەم لەسەر فكرێك؛ ۲) كەلای خوارو خێچ‌و لاپان ف ۱) دمدمی مزاج؛ ۲) تیلهٔ كج‌پهلو.
**بیبار:** ۱) ئیسوّت؛ ۲) سەوزیەكە تیژوناوك بەتۆو ف ۱) فلفل سیاه؛ ۲) فلفل فرنگی.
**بێبارە:** بێ‌بەش ف بی بهره.
**بێباسك:** بیكەس‌و تەنیا، تەنیابال ف تنها و بی‌همكار.
**بێ‌باف:** ۱) باب‌مردو، سێوی، هەتیو؛ ۲) برێتی لەبەدئاكارو مرۆی پیس ف ۱) پدرمرده؛ ۲) كنایه از آدم هرزه و بدرفتار.
**بێباك:** نەترس، گوێ‌نەدەر ف بی باك.
**بێباوك:** بێ‌باف ف بی‌پدر.
**بێ‌بڕ:** زەوی كەم‌بڕشت، كەم دەرامەت ف زمین بی‌حاصل.
**بێ‌بڕانەوە:** هەرهە، تاهەتا ف جاویدان.
**بێ‌بژار:** زەمـینی پاك لەگیای خراپ‌و بێكـــارە ف زمینی كه عَلَفِ هرز نداشته باشد.
**بیبك:** بیبیلەی چاو، رەشكێنە ف مردُمِ چَشم.
**بێ‌بگار:** قوڵی بێ‌پەی ف بسیار عمیق.
**بێ‌بن:** ۱) زۆرقوُڵ، پەی‌نەدەر؛ ۲) كچێ كچیەتی دۆراندبێ ف ۱) بسیار عمیق؛ ۲) دختر بی‌بكارت.
**بیبن:** پشتێن، پشتان، كەمەربەند، كەمبەرە ف كمر بند.
**بێ‌بەخت:** ۱) بێ‌ئامان، پەیمان شكێن؛ ۲) كلۆڵ، نەگبەت، قەرەبەخت ف ۱) بدقول و پیمان‌شكن؛ ۲) بدبخت و كم‌شانس.
**بیبەر:** بیبار ف فلفل.
**بێ‌بەر:** ۱) داری بێ‌میوە؛ ۲) ماینی نەزۆك ف ۱) بی‌ثمر؛ ۲) مادیان نازا.
**بێ‌بەری:** بێ‌بەش: (ژنەكەی لەمیرات **بێ‌بەری** كردوە) ف محروم از ارث.
**بێ‌بەش:** بێ‌پار، بێ‌بەهر، هیچ پێ‌نەبڕاو ف محروم از سَهم.
**بیبی:** ۱) بوُكەڵەی منال؛ ۲) رەشكێنەی چاو، بیبك ف ۱) عروسك؛ ۲) مردم چشم.
**بێ‌بیر:** بێ‌هۆش ف فراموشكار.
**بیبیلكە:** باڵداریكی بچوكە ف پرنده‌ای است كوچك.
**بیبیلە:** ۱) رەشكێنەی چاو؛ ۲) منالّی ساوا لەزمانی منالاّندا ف ۱) مردم چشم؛ ۲) نوزاد بەزبان بچەها.
**بیبیلە گەڕە:** جۆرێ مارمێلكە ف نوعی مارمولك.
**بێ‌بێن:** ۱) بێ‌بۆن؛ ۲) بێ‌پشو، كەم‌حەوسەڵە ف ۱) بی‌بو؛ ۲) كم‌حوصله.
**بیبین:** پشتیند، پشتین، بیبن ف كمر بند.
**بێ‌بێهن:** بێ‌بێن ف كم‌حوصله.

**بیٚ پۆژ:** تەور، تەوەر ف تبر.
**بیٚ پەرکەم:** بیٚ لەمپەر، بیٚ کۆسپ و بەرهەڵست ف بلامانع.
**بیٚ پەی:** زۆرقوڵ، بیٚ بن ف بسیار ژرف.
**بیٚ پیڤان:** بەدەر لەپیٚوان و بەراوەرد کردن، زیاد لەئەندازە ف بی حد.
**بیٚ پیٚوان:** بەراوردی دەغل لەگۆترە ف برآورد غله.
**بیٚ تاب:** بیٚ تاقەت، ماندو ف ناتوان.
**بیٚتــار:** ١) بەڵاو دەرد، مسیبــەت؛ ٢) بیٚهـوشی، بوُرانــەوە ف ١) بلا و مصیبت؛ ٢) بیهوش شدن.
**بیتاقە:** بلٚیت، بتاقە، پەتە ف بلیط.
**بیٚ تام:** ١) ناخۆش، بیٚ چیٚژە؛ ٢) بیٚ چەورایی ف ١) بی‌مزه؛ ٢) بدون چربی.
**بیٚتان:** ١) سست و شل، بیٚ هیٚز؛ ٢) پەرژین نەکراو ف ١) سست و ناتوان؛ ٢) بی‌پرچین.
**بیٚتاو:** ١) بیٚ هیٚز و تابشت؛ ٢) سیٚبەر، سپی رۆژ ف ١) بی‌تاب؛ ٢) سایه.
**بیٚتاوان:** بیٚ گوناح، بیٚ خەتا، بیٚ سوچ ف بی‌خطا.
**بیٚتر:** زۆرتر، پتر ف بیشتر.
**بیٚتڤاب:** بیٚ تاقەت، بیٚ هیٚز ف ناتوان.
**بیٚتك:** باپشکیٚو، چنچکەسلاٚو ف گُل‌مژه.
**بیٚتن:** ١) پیٚژتن؛ ٢) بیٚژتن، دابیٚژتن ف ١) پُختن؛ ٢) بیختن.
**بیٚتۆ:** ١) بەبیٚ تۆ، تونەبی؛ ٢) بیٚ تۆم و بەزر ف ١) بی‌تو؛ ٢) خالی از هسته.
**بیٚتــو:** ١) بیٚتۆ؛ ٢) ئەگەر، گریمان: (**بیٚتو** بباریٚ تەڕ دەبین) ف ١) نگا: بیٚتۆ؛ ٢) اگر.
**بیٚ توان:** بیٚ هیٚز، بیٚتان ف ناتوان.
**بیٚ توتە:** ماڵ بەکۆڵ و ڕەبەن، بیٚ ئەنوا ف بینوا.
**بیٚتوك:** ١) سادە، بیٚکوڵکە؛ ٢) بریٚتی لە نەدار و نزار ف ١) سادە؛ ٢) کنایه از فقیر.
**بیٚتە:** ١) بیٚتۆ؛ ٢) هاتنیٚ بکا: (با **بیٚتە** ئیٚرە) ف ١) بدون تو؛ ٢) بیاید.
**بیٚ تەرەف:** بیٚ لایەن، تەریك، دورەپەریٚز ف کناره‌گیر.
**بیٚ تەشە:** بیٚ تاقەت و لەکارکەوتە ف بی تاب و توان.
**بیٚتــەل:** لاسلکی، بیٚ سیم: (**بیٚتــەل** چیە؟ شیعـری ماریکـونی) «مەلا فەتاح وەهبی» ف بی‌سیم.
**بیج:** زۆڵ، حەرامزادە ف حرامزاده.
**بیٚجا:** نابەجیٚ، نارەوا ف نابجا.
**بیٚجگە:** بەجگە، بل ف بجُز.
**بیٚجەرگ:** ترسەنۆك، قزە ف ترسو.
**بیٚجیٚ:** ١) بیٚجا؛ ٢) لەقەرز نابوت: (قەرزی کردوە ئیٚستا **بیٚجیٚ** دەرچوە) ف ١) نابجا؛ ٢) ورشکست.
**بیچ:** زۆڵ، بیژو، بیج ف حرامزاده.
**بیٚچارە:** بیٚ دەرفەت، بەسەزوان، هەژار ف بیچاره.
**بیٚچاووڕو:** بیٚ شەرم و حەیا، بەڕو ف پر رو، بی‌شرم.
**بیٚچاوەڕو:** بیٚچاووڕو ف بی‌شرم و حیا.
**بیٚچاویٚنی:** بەدور لەچاوی پیس ف دور از چشم بد.
**بیچکەلانە:** چکۆلوکە: (وەرە بت بینم دەم **بیچکەلانە**) ف کوچولو.
**بیچکەلۆکە:** بیچکەلانە ف کوچولو.
**بیچکەلە:** بیچکەلانە ف کوچولو.
**بیٚچولە:** بەچك: (**بیٚچولە**مار) ف بچهٔ مار و حشرات.
**بیٚچەك:** ڕوت لەئامرازی جەنگ، بیٚ سیلاح ف بی سلاح.
**بیچم:** ١) شکـڵ و هەندام؛ ٢) تەرح و دیدار؛ ٢) تەرز و شیٚوە، جۆر؛ ٤) گزیکار و حیلەباز ف ١) هیئت؛ ٢) سر و سیما؛ ٣) شیوه؛ ٤) ناروزن.
**بیٚچو:** ١) وەچە، زا، بەچکی ئاژەڵی وردە و مەل و خشۆك؛ ٢) جۆریٚ پوُڵی عوسمانی ف ١) بچه؛ ٢) واحدی در پول عثمانی.
**بیٚچولە:** ١) بەچکی ساوا؛ ٢) ماسولەی خەڕەك ف ١) نوزاد؛ ٢) ماسورهٔ دوك.
**بیٚچون:** بیٚ هاوتا ف بی نظیر.
**بیٚچی:** بەرخ و کاریلە ف بچه دام.
**بیٚچیڤان:** شوانی بەرغەل ف چوپان برّه و بزغاله.
**بیٚحاڵ:** ١) نەخۆشی لەسەرمردن؛ ٢) هەژار و ئاتاج ف ١) مرض الموت؛ ٢) بینوا و محتاج.
**بیٚخ:** بن و ڕیشە ف بیخ.
**بیٚخ بڕ:** بن بڕ، لەڕەگ دەرێنان ف ریشه‌کن.
**بیٚخۆ:** سەربەخۆ، بیٚ پرس، بیٚ مانا ف خودسر.
**بیٚخود:** بیٚخۆ ف بیخود.
**بیٚخودی:** ١) بیٚخۆ؛ ٢) بوُرانەوە، لەهۆش چون ف ١) بیخودی؛ ٢) از حال رفتن.
**بیٚخوست:** وس، بیٚ دەنگ و بیٚ جوُڵە ف بی حرکت و صدا.
**بیٚ خولق:** بی کەیف، وەڕەز ف پکَر، ناراحت.
**بیٚ خوڵك:** بیٚ خولق ف پکَر.
**بیٚ خەبەر:** ١) بیٚ ئاگا؛ ٢) کتوپڕ، لەنکاو ف ١) بی‌خبر؛ ٢) ناگهان.
**بیٚخەم:** خاترجەم، دڵ ئاسودە، ئارخەیان ف آسوده‌خاطر.
**بیٚدا:** زیاد لەئەندازە ف زیاد از اندازه.
**بیٚداد:** ١) بیٚدا، زیاد لەئـەندازە؛ ٢) لەدوای داد دیٚت واتا: هاوار ف ١) بیش از حد؛ ٢) بیداد.
**بیٚدار:** ١) نەخەوتو؛ ٢) لاواز: (زۆر **بیٚدارو** بارە) ف ١) بیدار؛ ٢) لاغرمردنی.
**بیٚداوی:** ١) لەدوانەهاتو، بیٚ بڕانەوە؛ ٢) کاری بیٚ بەهرە و نەتیجە ف ١) بی نهایت؛ ٢) بیهوده.
**بیٚدڵخە:** حەوت ڕۆژ لەچلەی چوکی زستاندا ف هفت روز در چلّه کوچك.
**بیٚ دوایی:** بیٚداوی ف نگا: بیٚداوی.
**بیٚدۆش:** دەفری شیردۆشین، بیٚرەدۆش ف ظرف شیردوشی.
**بیٚ دوندان:** ئاژەڵی نەزۆك ف دام نازا.
**بیٚدەر:** ١) خرمـان؛ ٢) بیٚ پەناوبیٚکەس: (بیٚکەس و بیٚدەر خۆم) ف ١) خرمن؛ ٢) بینوا.
**بیٚ دەرەتان:** چارە نەماو، ڕیگەی نەجات لیٚ بەستراو ف بیچاره و

درمانده.

**بێدەس:** ١) نەدارو هەژار؛ ٢) دەست نەڕویشتو ف ١) فقیر و نیازمند؛ ٢) ناتوان.

**بێدەست:** بێدەس ف نگا: بێدەس.

**بێدەم:** شەرمن لە قسەکردنا ف خجالتی.

**بێدەمـار:** ١) خۆ بەزل نەزان؛ ٢) بێ غیـرەت ف ١) متواضـع؛ ٢) بی غیرت.

**بێدەموپل:** ١) بێدەم؛ ٢) قسەنەزان ف ١) خجالتی؛ ٢) نافصیح.

**بێدەمودوان:** کەم قسە ف کم حرف.

**بێدەنگ:** ١) هیچ نە وێژ؛ ٢) ئارام ف ١) خاموش؛ ٢) آرام.

**بێدین:** بێ ئاین، لەخوانەترس ف بی دین.

**بیر:** ١) چاڵاو؛ ٢) هزر، فکر؛ ٣) یاد: (بیرت دێ عەبای پیوەبو جێ باری لمت) «خەییام» ف ١) چاه؛ ٢) تفکُر؛ ٣) یاد.

**بێر:** ١) پێمەڕە، بێڵ؛ ٢) کۆبونی ئاژەڵ بۆ دۆشین؛ ٣) جێگەی دانیشتنی حەیوان گر بۆ دۆشین، بەردەبێر؛ ٤) بەهرە: (ولاتێکی بەخێرو بێرە) ف ١) بیل؛ ٢) جمع شدن گلّه برای دوشیدن؛ ٣) جای آنکه حیوان را برای دوشیدن نگهمیدارد؛ ٤) بهره، فایده.

**بیرا:** بەزەین، زۆر بەبیر و هۆش ف زیرك و باهوش.

**بیراز:** ١) گڕنی کردنی بەرداش: (بەرداش لوس بوه بیراز کردنی دەوێ)؛ ٢) رێك و بێ کلۆ کردنـی زەوی، تەخت کردن: (زەویم بیراز کردوە بۆ توتن) ف ١) مرمّت و تعمیر سنگ آسیا؛ ٢) صاف کردن شخم.

**بیرازتن:** ١) بیرازکردنی بەرداش؛ ٢) تەخت و لوس کردنی زەوی ف نگا: بیراز.

**بیرازکردن:** ١) بیرازتن؛ ٢) برێتی لە دارکاری و تەمێ کردن ف ١) تعمیر سنگ آسیا؛ ٢) کنایه از کتك کاری.

**بێرانە:** بهێنە: (شایی کوڕمانە رەزیلی مەکە هەر پەنج کەس دونان **بێرانە**) ف بیار.

**بیراو:** چاڵاو ف چاه آب.

**بێراقك:** سەوڵی کەڵەکەوان و قەیاغ وان ف پاروی قایقرانی.

**بێرایی:** باران نەگر، هەیوانۆکە ف تراس.

**بیربـردن:** لەهـزردامـان، لەبیرمـان، لەبیر بـون؛ ٢) لەبیرچـون ف ١) بیادماندن؛ ٢) فراموش کردن.

**بیربلاو:** فکر پەرێشان، خەیالاوی، کەم هۆش ف کم هوش وپریشان خاطر.

**بێربێروك:** گوڵەستێرە ف کرم شبچراغ.

**بیرچون:** لەیادچون ف فراموش کردن.

**بیرچونەوە:** لەیادچونی ئەوی زانراو ف فراموش کردن.

**بیرخستنەوە:** بەیاد هێنانەوە ف یادآوری.

**بێرك:** ١) گیرفـان، بەریك، جێو، بەرك؛ ٢) بێڵی پچـوك، خاکـەنـازی چکۆڵە؛ ٣) بێر، جێ دوشینی ئاژاڵ؛ ٤) گۆمیلکە لەچیا ف ١) جیب؛ ٢) بیلك؛ ٣) جای دوشیدن گلّه؛ ٤) استخر طبیعی در کوه.

**بیرکردن:** ١) یادکردن، تاسە؛ ٢) لەبیرچون، فەراموش کردن: (خودێ من **بیرکرد**) ف ١) یادکردن؛ ٢) فراموش کردن.

**بیرکم:** دەریاچە، زرێبار، گۆل ف دریاچه.

**بێرکم:** قەفەس، ڕکە ف قفس.

**بیرکەم:** کەم هۆش، کەم زەین، کەم بیر ف کم هوش.

**بیرکەوتنەوە:** وەیاد هاتنەوە ف بیادآمدن.

**بێڕو:** ١) شەرمن، شەرمیون، فەدیکـار؛ ٢) بێشـەرم و ڕوهەڵماڵاو ف ١) خجالتی؛ ٢) پر رو.

**بێرۆ:** بگەڕێوە، وەگەڕێ، وەرەوە ف برگرد.

**بیرۆ:** نەخۆشی پێستە وشکوتەڕی هەیە ف اکزما.

**بێروخ:** ناوچەیەکە لەکوردستان ف ناحیه‌ای در کردستان.

**بیروَق:** ١) بیرۆ؛ ٢) تیروێ، دارێکی دەوەنە ف ١) اکزما؛ ٢) درختچه‌ای جنگلی.

**بێرون:** ١) چۆڵ و بیابـان؛ ٢) بەشـەخانوی میوان و پیاوان، بەرانبەری ئەندەرون ف ١) بیابان؛ ٢) قسمت بیرونی خانه.

**بێڕۆن:** بێ چەوری ف بدون چر بی.

**بێرونی:** خانوی میوانخانە، بێرون ف قسمت بیرونی خانه.

**بێرە:** ١) جێگەی دۆشینی کۆمەڵی ئاژاڵ، بێر؛ ٢) بهێنە، بارەی؛ ٣) وەرە، بێ؛ ٤) بەم شوێنە: (چەندێکە **بێرە** فێر بوە ناڕوا) ف ١) جای دوشیدن گلّه؛ ٢) بیار؛ ٣) بیا؛ ٤) به‌اینجا.

**بیرە:** ئاوجۆ، قەخوارنێکە لجەهـ دکن ف آبجو.

**بیرهاتنەوە:** کەوتنەوە یاد ف یادآمدن.

**بیرەخەو:** سوکەلەخەو ف پینکی.

**بێرەدۆش:** ١) مەڕدۆش، ئەوکەسەی ئاژەڵ دەدۆشێ؛ ٢) دەفری شیر تێدا دۆشین ف ١) شیردوش؛ ٢) ظرف شیردوشی.

**بیرەوە:** یادکرنەوەی ساڵانەی شتێکی عەزیز، بیرەوەری ف یادبود.

**بێرەوە:** بگەڕێوە، بێرۆ ف برگرد.

**بیرەوەر:** خاوەن فکر و بەزەین، بیرا ف متفکر.

**بیرەوەری:** ١) یاداشت، نوسینـەوەی ڕوداو؛ ٢) یادکردنەوەی ساڵانەی مردوی گەورە ف ١) یادداشت؛ ٢) یادبود.

**بێڕەهـ :** بێ ڕەگ، بێ غیرەت ف بی رگ، بی غیرت.

**بیرهێنان:** خستنەیاد ف یادآوری.

**بیرهێنانەوە:** وەیاد هێنانەوەی لەبیرچو ف یادآوری کردن.

**بێڕێ:** ١) نەبەشەقامدا؛ ٢) برێتی لەبێ ناکارو ناپەسەند ف ١) بیراهه؛ ٢) بدکردار.

**بێری:** ١) مەڕدۆش، دۆشەری ئاژاڵ؛ ٢) یاد: (م **بێری** یاتە کر بو) ف ١) شیردوش؛ ٢) یاد.

**بێرێتـە:** جۆرێ سەمـای بەکـۆمەڵ، یەکێك لەداوەتی کوردان ف نوعی رقص دسته‌جمعی.

**بێریڤان:** مەڕدۆش: (ئەز حەلاندم **بێری ڤانا** پەزی) ف شیردوش.

**بێز:** ١) رەنگ: (ئەم قاڵی‌یە لەبێزی هاوتاکەی نیە)؛ ٢) ئیشتیا، واز: (**بێزم** نایە بیخـۆم)؛ ٣) دڵ لێ هەڵەنگوتن، قێز: (**بێزم** لێ دەبێتەوە) ف ١) رنگ؛ ٢) اشتها؛ ٣) تهوّع.

**بیزا:** گیایەکی بەنـاوبانگە بۆ ترشیات و بۆناو شیرێژ بەکاردێ ف گیاهی

است مشهور.

**بێ‌زات:** ترسەنۆك، ترسۆنەك، بێ‌زراو ف بُزدل، ترسو.

**بێ‌زاد:** بێ‌دەغڵی ئازوقە لەماڵدا ف بی آذوقه.

**بێزار:** ١) وەڕەز، جارس، جاڕز؛ ٢) دەم‌خوار؛ ٣) بێ‌دەم، کەسێ دەڤـی نەبـێ: (وتم ئایا بەزاری خۆت دەپـــرسی حاڵی زاری من؟ / بڕۆی هێنـایە یەك وەك شکڵی لا یەعنی کە**بێزارم**) «نالی» ف ١) بیزار: ٢) دهان‌کج؛ ٣) بی‌دهان.

**بێزان:** وەڕەزبون، لەبەردڵ لاچون: (دڵم لێی **بێزاوە**) ف بیزارشدن.

**بێزران:** بێزان ف از چشم افتادن.

**بێزراو:** ١) لەبەرچاو کەوتو؛ ٢) ترسەنۆك ف ١) از چشم افتاده؛ ٢) بُزدل.

**بێزکردن:** دڵ‌هەڵەنگوتن لەدیتنی کەسێ یا شتێ ف حال بهم خوردن از دیدن کسی یا چیزی.

**بێزگ:** مەگیرانی، ئارەزوی ژنی تازە حامیلە ف ویار.

**بێزگەوان:** مەگیرانی کەر، ژنێ کەبێزگ دەکا ف زن و یاردار.

**بێزنەهاتن:** ئارەزو نەکردن، دڵ‌لێ شێوان، خۆش نەویستن ف متنفر بودن.

**بێزو:** بێزگ ف ویار.

**بێزوکردن:** مەگیرانی کردنی تازە سك‌پڕ ف ویارکردن.

**بێزوکەر:** مەگیرانی کەر، بێزگەوان ف ویاردار.

**بێزە:** ١) منـاڵی ناوسـك، تۆل، پیزە، پێزی، پس، پز؛ ٢) سیراج، شیرێژ، ژاژی؛ ٣) پوڵێکی کەم: (بە **بێزە**یەك نایکڕم) ف ١) جنین؛ ٢) شیراز؛ ٣) پشیز.

**بێزەڕۆ:** گیایەکی گەڵاوردی ناوئـاوە، تامی تیژەو لەتیرەی کوزەڵـەیە ف گیاهی است آبزی.

**بێزەواد:** بێ‌نان‌و بژیو لەماڵدا ف بی‌قوت لایموت.

**بێزی:** بێزو، بێزگ ف ویار.

**بێزیاگ:** لەبەرچاو کەوتو، بێزراو ف ازچشم افتاده.

**بێزیان:** بێزران، بێزان ف از چشم افتادن.

**بێژ:** ١) پاشگری بەواتا: بێژەر: (گۆرانی **بێژ**، ستران **بێژ**)؛ ٢) پاشگری بەواتا: لێدەری ئامرازی موزیك: (بلوێر **بێژ**، تەنبور **بێژ**)؛ ٣) دابێژەر، لەبێژنگ دەر: (ئارد**بێژ**) ف ١) پسوند بەمعنی گوینده؛ ٢) نوازنده؛ ٣) بیزنده.

**بێژار:** ١) ڕیتاڵ، بزگور، لەت‌و دڕاو: (کراس‌و کەوای **بێژار بێژارە**)؛ ٢) بێژەهر: (ماری ڕەش **بێژارە**) ف ١) سوراخ و پارەشده؛ ٢) ماری کە سم ندارد.

**بێژان:** ١) گیایەکی بۆن توندی گوڵ‌زەردە کە مێش توخنی ناکەوێ؛ ٢) دابێژتن بەهێڵەگو بێژنگ کردن؛ ٣) گوتن، ئاخافتن، ئیشتیغالی ف ١) گیاهی است با گل زرد که مگس از آن گریزد؛ ٢) بیختن؛ ٣) گفتن.

**بێژانن:** دابێژتن، بێژان ف بیختن.

**بێژانە:** گیای بێژان ف گیاه «بێژان».

**بێژانـەوە:** ١) دوبـارە لەهێڵەگ دان؛ ٢) دوپـاتە کردنەوەی قسە ف ١) دوبارە بیختن؛ ٢) دوبارە گفتن.

**بێژتن:** دابێژان، لەهێڵەگ دان ف بیختن.

**بێژتی:** دابێژراو، لەهێڵەگ دراو ف بیخته.

**بێژمار:** لەژمارە بەدەر ف بی‌حدّ.

**بێژن:** ١) بێژنگ، هێڵەگ، قەڵبیر، مۆخڵ؛ ٢) دەنگی جوڵان‌و بزوتن؛ ٣) پیاوێ ژنی نەبێ، سەڵت‌و ڕەبەن ف ١) غربال؛ ٢) صدای حرکت؛ ٣) مرد مجرد.

**بێژنگ:** قەڵبیر ف غربال.

**بیژو:** زۆڵ، بیچ، حەرامزادە ف حرامزاده.

**بێژو:** کەم‌شیر، ژن‌و ئاژەڵی کەم‌شیر ف زن یا حیوان کم‌شیر.

**بێژۆك:** چەنەباز، زۆربێژ، چەقەسرۆ، چەڵتەباز، زۆربڵـێ، فرەوێژ ف وراج، یاوەگو.

**بیژۆك:** ١) بەرهـەمی نائـاسـایی: (ئەوگیسکە **بیژۆکە** زێ‌یە، ئەو نیسکە **بیژۆکـــە** ناکـــوڵێ)؛ ٢) بزنێ کە هەر بەدوسـاڵی بزێ؛ ٣) ددان یان ئەنگـوستی زیاد لە ئاسایی ف ١) غیرعادی؛ ٢) حیوانی کە یکسال قبل از موعد بزاید؛ ٣) دندان یا انگشت اضافه.

**بێژە:** وێژە ف ادبیّات.

**بێژەك:** ١) ئاژەڵی کەم‌شیر؛ ٢) قەوان، گرامەفۆن، سندوقی سترانان ف ١) حیوان کم‌شیر؛ ٢) گرامافون.

**بێژەن:** گۆرانی بێژ ف ترانەخوان.

**بیژی‌ڕەش:** گەنمە گوڵ‌ڕەش ف گندم سیاه خوشه.

**بێژین:** ١) دابێژتن، بێژتن؛ ٢) بێزو، مەگیرانی؛ ٣) بڵێین ف ١) بیختن؛ ٢) ویار؛ ٣) بگوئیم.

**بیس:** ١) شنەفتن، گوێ لێ‌بون، ژنەوتن، بیستن: (نە**بیسێ**، نا**بیسێ**)؛ ٢) دوجار دە، بیست ف ١) شنیدن؛ ٢) بیست.

**بێس:** ناوجی‌کەر ف میانجی.

**بێ‌سامان:** ١) لەئەندازە بەدەر، لەرادە بەدەر؛ ٢) بێ‌ماڵ، فەقیر، نەدار ف ١) خارج از حد؛ ٢) فقیر و محتّاج.

**بێسان:** بێستان، جێگەی کاڵەك‌و شوتی‌و... ف جالیز.

**بێسانەوان:** ئاگاداری بێستان ف جالیزبان.

**بێسانەوە:** هەمیشەماندو، دور لە ئیسراحەت ف بی استراحت.

**بێساو:** داسی کول کە لەهەسان‌دانی دەوێ ف داس کُند.

**بیست:** بیس ف عدد بیست.

**بێستان:** بێسان ف جالیز.

**بێستانەوان:** بێسانەوان ف جالیزبان.

**بیستراو:** بیسراو، ژنەوتو، شنەوتە، بیستی ف شنیده شده.

**بیستن:** بهیستن، گوێ لێ‌بون، شنەفتن، ژنەوتن ف شنیدن.

**بیستنەوە:** ١) دوبارە شنەفتن؛ ٢) بیستنی قسەیە کەدەربارەت گوترابێ ف ١) دوبارە شنیدن؛ ٢) شنیدن حرفی دربارهٔ خویش.

**بیستۆك:** تەلەیفون، تێل، تەل ف تلفن.

**بیستەم:** دوای نۆزدەهەم ف بیستم.

**بێسعود:** بەدبەخت، کلۆڵ، چارەڕەش ف بدبخت.

**بیسمیل:** شوشتنی شتی مردار کە بیسمی‌للای لەسەر دەڵێن: (سەگ

خۆی لێدام چوم جێکاکەم **بیسمیل** کرد) ف شستشوی جائی که نجس شده.

**بیسن:** بیستن ف شنیدن.

**بێسۆ:** ۱) بێگومان، راست، دروست؛ ۲) بۆنی لۆکەی سوتاو ف ۱) بی‌گمان؛ ۲) بوی پنبهٔ سوخته.

**بێسو:** ڕەبەت، بۆسە، حەشارگەی ڕاوچی، مردەو زیندە، سیپە ف کمین‌گاه شکارچی.

**بێسۆز:** بەدقەوڵ، پەیمان شکێن ف بدقول.

**بێسوس:** پیڤ سوز، چرای بەرێ کە پیو یان تێ دە کرد ف چراغ پیه‌سوز.

**بێسە:** ۱) بێ‌نرخ، سوك لای خەڵك؛ ۲) ڕاوەستە ف ۱) بی‌ارزش؛ ۲) بایست.

**بێسەر:** بێ‌حیساب‌و هەژمار، ئازاد: (**بێسەر** هەرچێ دەبەی ببە) ف بی‌حساب و اندازه.

**بیسەر:** گوێ‌دێر، گۆهدار، گوێگر، شنەوننە ف شنونده.

**بێسەروبن:** ۱) تێکەڵ پێکەڵ، لێکدراوو تێکدراو؛ ۲) لەڕادەو ژمارە بەدەر ف ۱) درهم برهم: ۲) از شماره بدر.

**بێسەروبەر:** حاڵ‌شڕ و لێقەوماو، نەدارو هەژارو پەك‌کەوتە ف بدحال و پریشان.

**بێسەروپا:** شەلاتی، لات، چەورە، خوڕی‌و توڕی، بێکارەو خوێڕی ف اوباش و بی‌سروپا.

**بێسەرو پێ:** بێسەروپا ف بی‌سروپا.

**بێسەروزمان:** نەخۆشی بێهوشی لەمردن ف حالت اِغما.

**بێسەرو سەودا:** بێدەنگ‌و بێ‌هەرا ف ساکت و خاموش.

**بێسەروشوێن:** شرت‌وگوم، تەواو ونـدابـو: (وەفایی ئاخری خێر بێ دەمێکە **بێ‌سەرو شوێنە**) ف گُم‌وگور.

**بێسەری:** بێ‌سەرداری ف بی‌رهبری.

**بێسی:** ماستی هەڵگەڕاو یان ترشاو ف ماست تُرش شده.

**بێسیرە:** بەرسیلە، بەسیلە، قۆرە ف غوره.

**بێسێرە:** گوێ‌نەدەر بەهیچ، گەللایی، حولحولی ف حرف نشنو و لاقید.

**بێسیم:** لاسلکی، بێ‌تەل ف بی‌سیم.

**بیش:** ۱) رونێ، دانیشە، بنیش؛ ۲) مێشە، بێشە ف ۱) بنشین؛ ۲) بیشه.

**بێش:** ۱) بەش، بەهرە؛ ۲) باج، پیتاکی دەولەت یان خان ف ۱) قسمت و سهم؛ ۲) باج دولت یا خان.

**بێشك:** ۱) لانك، لاندك، دەرگوش، دەیدیك، بێشکە؛ ۲) بێگومان‌و سۆ ف ۱) گهواره؛ ۲) بی‌گمان.

**بێشکە:** ۱) لانـك، بێشـك؛ ۲) ساواله بەرخ‌و كار؛ ۳) مەشکە ف ۱) گهواره؛ ۲) نوزاد بز و گوسفند؛ ۳) مَشك.

**بێشۆ:** لەڕادە بەدەر، زیاد لەئەندازە ف بی‌حدّ.

**بێشومار:** لەژمارە بەدەر، یەکجار زۆر، بێژمار ف بیشمار.

**بێشون:** پەیمان‌شکێن، بێ‌وەفا ف بدقول و بی‌وفا.

**بێشوێن:** وندابو، شرت‌وگوم، بێ‌سەروشوێن ف بی‌اثر.

**بێشە:** مێشە، دەحل، لێڕی دەسنێژ ف بیشه.

**بێشەرم:** روهەڵماڵاو، بێ‌حەیا، بەڕو ف بی‌شرم.

**بێشەلان:** جێگەی پڕدارو دەوەن، چغور ف بیشه و نیزار.

**بێشەلانك:** قوڵکەی ئاش کە ئاوی ئاشی لێ دەر دەکەوێ ف گودی که آب آسیاب از آن خارج شود.

**بێشەما:** جۆرێ توتنی بۆندارە ف نوعی توتون مرغوب.

**بێشـەمە:** بێشەما: (بۆ توتنەکەی **بێشەمەوُ** شاورو شێتنە / شێت‌بوم‌و نەهات. وەختە دڵم دەرچێ لەداغا) «شێخ‌رەزا» ف نگا: بێشەما.

**بیشەنگ:** شوڕەبی، شەنگەبی ف بید مجنون.

**بێشیر:** ئاژەڵی وشك کردو، کەم‌شیر ف حیوان شیر خُشك کرده.

**بێشیرە:** بەرسیلە، قۆرە ف غوره.

**بێشیك:** بێشکە، لانك ف گهواره.

**بێع:** پێشەکی سەودا: (**بێعم** دەیە ماڵی تو بێ)، بەیعانە ف بیعانه.

**بێعار:** بێ‌شەرم‌و هاروهاج ف بی‌شرم، بی‌عار.

**بێعانە:** بێع ف بیعانه.

**بێفرشك:** بریەتی لەپیاوی بێ‌شەرم‌و بێکارەو تەمەڵ ف کنایه از آدم ناباب و بیکاره.

**بیڤ:** هەل، دەرفەت ف فُرصت.

**بێڤا:** نابەجێ، قسەی قۆڕو بێتام، قسەی لابەلا ف نابجا.

**بیڤر:** تەور، بڤر، بیور ف تَبر.

**بیڤك:** دوژمنایەتی، دژایەتی ف عداوت، دشمنی.

**بیڤل:** بی‌بیلە، رەشکێنەی چاو، گلێنەی چاو ف مردُمك دیده.

**بێڤل:** کەپۆ، کەپ، لوُت، دم، پۆز، قەپۆز، دفن ف بینی.

**بێڤەر:** ناهۆمێد، هەناسەسارد ف نومید.

**بێڤەری:** ناهۆمێدی، هەناسەساردی ف نومیدی.

**بیڤێر:** نەخۆش لەسەر مردن، کەنەفت، کەلەلا ف بیمار در حال مرگ.

**بیڤیر:** گیایەکە لەجۆ ئەکا ف گیاهی شبیه جو.

**بێقام:** لەرێ دەرچو، رێگەی راست ون‌کردو ف گُمراه.

**بیك:** ۱) وەوی، بوك، بوُیك؛ ۲) داربی ف ۱) عروس؛ ۲) بید.

**بێکار:** بەتاڵ، بێ‌شول ف بیکار.

**بێکارە:** تەمەڵ، تەوەزەل، لەش‌گران ف بیکاره، تنبل.

**بیکانێ:** بوك‌بوکێنەی منالان، گەمەی بوکەڵە ف عروسك‌بازی.

**بیکمار:** مارمێلکە، مارمزوك ف مارمولك.

**بێکوانە:** دەموکانە ف مویزك.

**بیکۆڵ:** دارەبی خۆرسك ف بیدخودرو.

**بێکەس:** بێ‌خزم‌و سەرپەرشت ف تنها و بیکەس.

**بێگ:** بەگ، گەورە، ئاغا ف بَیگ.

**بێگار:** کاری بەگ بەزورداری، کاری زورەکی‌و بەخۆڕایی ف بیگار، سُخره.

**بێگارچی:** ئەوەی بێگار دەکا ف کارگر سُخره.

**بێگاری:** کاری بێگار ف بیگاری.

**بێگاڤ:** بێ‌وەخت، ناوەخت ف نابهنگام، بی‌موقع.

**بێگاڤی:** بێگاڤ، بەناوەختی ف نابهنگام.

**بێگانە:** غەوارە، نەناس، لاوەکی، بیانی، خەریب ف بیگانە.
**بێگانەبەدەر:** خۆمالّیمان، وەشەیەکە بۆ رۆیشتنی غەوارە، لەکۆڕ دەکوترێ ف اصطلاحی برای بیرون فرستادن بیگانە از مجلس خودی.
**بێگانەپەرست:** جاش، نیشتمان فرۆش ف بیگانەپرست.
**بێگۆ:** بۆژۆ ف گیاهِ بوگرفته.
**بێگۆه :** گویّ نەبیس، ئەژنەو، سەرسەخت، لاسار ف حرف نشنو.
**بێگوێ:** بێگۆه ، بی گوێچکه ف حرف نشنو.
**بێگەف:** لاسارو تی نەگەیشتو، هەقمەق ف سرسخت و احمق.
**بێگەفی:** لاساری، سەرسەری بون ف هرزگی و بی‌بندوباری.
**بێگەن:** بۆگەن، بۆنی ناخۆش ف بوی گند.
**بیل:** خاك، خۆڵ ف خاك.
**بێڵ:** ۱) پێمەڕە؛ ۲) پاڕوی دارین ف ۱) بیل؛ ۲) پارو.
**بێلا:** ئەنوا، باران‌نەگر، هەیوان ف تراس.
**بێلانە:** بێ‌هێلانە، بریتی لە رەبەن‌و بی‌ئەنوا ف کنایە از آوارە.
**بێلایی:** بەرهێوان، سەکۆی سەر داپۆشراو ف تراس، ایوان.
**بیلبیلە:** رەشکێنە، گلێنەی چاو ف مردُمك دیدە.
**بێڵتەپکردن:** بنکۆڵ کردنی دار لە بەهاردا ف سست کردن خاك درخت.
**بێڵچە:** پێمەڕەی چکۆڵە، بێڵ ئاسنی دەستی ف بیلچە.
**بێڵکار:** بێڵچە ف بیلچە.
**بێڵکاری:** کار بەپێمەڕە ف بیلکاری.
**بێلندان:** جەژنێکی خاچ‌پەرستانە ف از اعیاد مسیحیان.
**بێلۆ:** سەرچاوەیەك کە بەهار دەژێتەوە، کوێرەکانی ف چشمەای کە تابستان بخُشکد.
**بێڵۆچکە:** بێڵی چکۆلەی ئاشەوان بۆ ئارد، پاڕۆ ف بیلچهٔ آسیابان.
**بێلوز:** جۆرێ هەرمێ ف نوعی گُلابی.
**بێڵە:** ۱) بهێڵە، لێ گەڕێ، وازبێنە؛ ۲) هاواری بزن، بارە ف ۱) بُگذار؛ ۲) صدای بُز.
**بێڵەبێڵ:** هاوار هاواری بزن ف صدای پیاپی بُز.
**بێڵەدارینە:** پاڕۆ ف پارو.
**بیلەك:** زەندانە، زرێی باسك‌و قوڵ ف زندپیچ.
**بێڵەکان:** پیشکان، پیشك ف ابزار گیاه کندن.
**بێڵەکۆ:** خۆڵەکەوە، مشکی، خۆڵەمێش ف خاکستر.
**بێڵەکەڕە:** مارمیلکەی شەوگەڕ ف نوعی مارمولك.
**بێڵەوە:** بهێڵەوە، رابگرە ف بهل.
**بێڵەهەڕ:** گیایەکی کوێستانیە دەکرێتە گزرە ف گیاهی کە برای علف کوبند.
**بێلتیڤان:** گۆرانی بێژی داوەت‌و زەماوەند ف رامشگر.
**بێلیتە:** ۱) سەماو ستران پێکەوە؛ ۲) بێریتە ف ۱) رقص و ترانە با هم؛ ۲) نوعی رقص گروهی.
**بێلیڤە:** بێ‌دەرەتان ف آوارە و دربدر.
**بێم:** ۱) بام، وەرم؛ ۲) دەڵێم، دەبێژم: (ئەز بێم‌و لۆنینە)؛ ۳) بەبێ من ف ۱) بیایم؛ ۲) بگویم؛ ۳) بدون من.
**بیم:** ۱) ترس؛ ۲) بوم ف ۱) ترس و بیم؛ ۲) بودم.
**بێماد:** رەنگ‌وڕۆ ناخۆش ف رنگ‌پریدە.
**بیمار:** لەش بەبار، نەساغ، نەخۆش ف بیمار.
**بیمارسان:** نەخۆشخانە، خەستەخانە ف بیمارستان.
**بیمارستان:** بیمارسان ف بیمارستان.
**بیماری:** نەخۆشین، نەساخی ف بیماری.
**بێمراد:** بەئاوات نەگەیشتو، کام نەدیو ف ناکام.
**بێمرێس:** بێ کەیف، نائاسایی، بێماد ف بی‌حال.
**بێمك:** فەریکە قەزوان ف چغالهٔ ثمر بنە.
**بێمۆك:** جۆرێ قەزوانی ورد ف نوعی ثمر ریزبنە.
**بیمە:** دابین ف بیمە.
**بێمە:** ۱) بەبێ ئێمە؛ ۲) بێم ف ۱) بدون ما؛ ۲) بیایم.
**بێ‌مەژگ:** بێ‌مێشك، گەوج، بێهۆش‌و گۆش ف بی‌مُخ.
**بێمەژی:** ۱) بێ‌مەژگ؛ ۲) وەبێ ئێمەیش ف ۱) بی‌مُخ؛ ۲) بدون ماهم.
**بێمەعد:** بێماد، بێ‌مرێس ف بی‌حال.
**بیمەلەرزە:** بومەلەرزە ف زلزلە.
**بێمێ:** بۆی بێم ف بخاطرش بیایم.
**بێمێشك:** بێ‌مەژگ ف بی‌مُخ.
**بیمیشك:** جورێ بیە گوڵی سپی بۆنخۆش دەکا ف بیدمشك.
**بێن:** ۱) بۆن، بۆ؛ ۲) بەند، بەندکەر: (زاربێن، دەم بێن)؛ ۳) نزیك‌بنەوە: (بێن بتان بینم) ف ۱) بو؛ ۲) بند؛ ۳) بیایند.
**بین:** ۱) هەناسە، نەفەس: (لەبن گۆما بین دەکێشم)؛ ۲) گەرو: (دەستی دەبینی ناوە ئەیخنکێنێ) ف ۱) نفس؛ ۲) گلو.
**بێنا:** تاسەر، هەرماو، لەبڕان بەدور ف بی‌نهایت.
**بینا:** زۆربین، چاوتیژ ف بینا.
**بێناز:** بێ‌سەرپەرشت، بێ‌خەمخۆر ف بی‌ناز، بی‌غمخور.
**بێنافتی:** جۆرێ هەنجیر ف نوعی انجیر.
**بێناو:** کەس‌نەناس ف گمنام.
**بێناوك:** میوەی بێ‌دەنك ف بی‌دانە.
**بیناهی:** رۆشنی چاو، سۆ، سۆمایی، سۆما، هەتەر ف بینایی.
**بێنایی:** جۆرێ هەنجیر، بێنافتی ف نوعی انجیر.
**بینایی:** بیناهی ف بینایی.
**بینایی‌چاوان:** خودا، خودێ ف خُدا.
**بێن‌خۆشك:** کنێرە ف گیاهی است.
**بێندۆش:** دەفری شیردۆشین ف ظرف شیردوشی.
**بێندەر:** بێدەر، خەرمان، خۆیان ف خرمن.
**بێنژین:** پژمین، پشمین، پنژین ف عطسەکردن.
**بێنشك:** پژمە، بێنژین ف عطسە.
**بێن‌فال:** بۆتەگە، بۆدڕنی نێری ف بوی تەگە وقت جُفتگیری.
**بێن کوزیرك:** بۆکڕوز ف نگا: بۆکڕوز.
**بینگ:** نەفەس، هەناسە ف نفس.

**بین گرتن:** مان کردن، سوڕانی مەیین: (ئەم خولخولە وادەسوڕیّتەوە بین دەگریّ)؛ ۲) قرّقرّاکە گرتن ف ۱) از شدت چرخش، ایستادە نمودن؛ ۲) گلو گرفتن.

**بیّنمایی:** بیّ نویّژی، حەیز ف حیض.

**بینموت:** پوّخەکە، پوتەکە، بیچم ناپەسەند ف بی نمود.

**بیّنمود:** بینموت ف بی نمود.

**بیّ نویّژ:** ژن لەکاتی حەیزدا ف زن هنگام حیض.

**بیّ نویّژی:** خویّن هەبونی ژن، حەیز ف حیض.

**بیّنە:** بهیّنە، بارە ف بیار.

**بینـە:** ۱) هەنـاسە خواردنەوە، پشو ویّستاندن؛ ۲) بهیّنە، بیّنە، بارە: ۳) هوّبە، زوّم ف ۱) نَفس حَبس کردن؛ ۲) بیار؛ ۳) اوبە.

**بینەقاقە:** ناوەندی گەروف بیخ گلو.

**بینە کیّشان:** پشو راگرتن لەبن ئاودا ف نفس گرفتن زیر آب.

**بیّنەوا:** بیّ نەنوا، هەژار ف بینوا.

**بیّنەوایی:** بیّ جیّ وریّو بیّچارەیی ف بینوایی.

**بینی:** دیتی، چاوی پیّ کەوت ف *فعل ماضی* : دید.

**بیّ نیاز:** کاربەکەس نا ف بی نیاز.

**بینین:** دیتن ف دیدن.

**بینینـەوە:** ۱) دوّزینـەوەی گوم بو؛ ۲) چاوپیّ کەوتنی دورکەوتو ف ۱) گم‌شدەای را یافتن؛ ۲) بازدید.

**بیّو:** ئەگەروابیّ: (بیّو باران نەباریّ) ف اگر چنین باشد.

**بیّوار:** نەزوّك ف نازا، یائس.

**بیّوارە:** غەوارە، بیّگانە، نەناس ف بیگانە.

**بیوْر:** بقر، تەور، بالّتە ف تَبَر.

**بیّورە:** ترسەنوّك ف بُزدل.

**بیوك:** گیایەکە ف گیاهی است.

**بیّولە:** بەچکەی ورچ ف بچەخرس.

**بیّوڵەت:** بیّ بەخت، چارەڕەش، کلّوڵ ف بدبخت و بیچارە.

**بیّوە:** ژن یان شوی جوتە مردو ف بیوە.

**بیّوەپیاو:** ژن مردو ف بیوەمرد.

**بیّوەج:** بیّ نرخ، بیّ قیمەت ف بی ارزش.

**بیّوەخت:** بیّ گاف ف نابهنگام.

**بیّوەر:** ۱) بیّ بەر، بیّ میوە؛ ۲) بیّ بەهرەو فایدە: (رەنجی بیّوەرم دا) ف ۱) بی ثمر و میوە؛ ۲) بی بهرە.

**بیّوەژن:** شومردو ف زن بیوە.

**بیّوەژن کوّشی:** بریّتی لە رەنجو دەردی هەژاری کیّشان بوّنان ف کنایە از تحمل رنج و فقر بسیار.

**بیّوەلە:** بەچکەساوای ورچ ف بچەخرس.

**بیّوەمیّرد:** بیّوەپیاو ف مرد بیوە.

**بیّوەی:** بیّ زیان، سەلامەت ف بی آزار.

**بیّویژان:** بیّژان، گیایەکی بوّن توندە ف گیاە «بیّژان».

**بیّ ویّنە:** بیّ هاوتا، بیّ هەواڵ ف بی نظیر.

**بیّ هاوتا:** بیّ ویّنە ف بی نظیر.

**بیهر:** تاسەو ئارەزوی زوّر ف اشتیاق.

**بیّهمان:** وشەیەکە دەگەڵ فلاّن ئیّژنی ف بهمان، مترادف فلان.

**بیهن:** ۱) بوّن؛ ۲) نَفَس ف ۱) بو؛ ۲) نفس.

**بیەنا:** بوگم ف بودەام.

**بیهن دان:** ئیسـراحـەت کردن، پشـودان: (پیچەکی **بیهنا** خوّبدە) ف استراحت کردن.

**بیەنە:** بیهیّنە ف بیارش.

**بیّهوّش:** ۱) دڵ بوراو؛ ۲) گیّژو نازیرەك ف ۱) مدهوش؛ ۲) ناهُشیار.

**بیّهوّش بون:** لەهوّش چون، بورانەوە ف ازهوش رفتن.

**بیّهوّش دارّو:** دەرمانی بیّهوّشی ف داروی بیهوشی.

**بیّهوّدە:** خوّرّایی، فیرّوّ، بیّ فایدە ف بیهودە.

**بیّ هەناو:** ترسەنوّك، بیّ زراو ف بُزدل.

**بی هەنجیر:** گەرچەك ف کرچك.

**بیەی:** بون ف وجود.

**بیّ هیّز:** بیّ وزە، بیّ توش، بی تابشت ف ناتوان.

**پا:** ١) لاق، قاچ، پیّ؛ ٢) بەرانبەر؛ ٣) پلە، دەرەجە؛ ۴) ئەندازە: (بەم **پا**یە بیّ)؛ ۵) هاو قومـار: (پـای قومار)؛ ۶) پەلەپیتکە؛ ٧) لەمل، لەعودە: (ئەم کارە **پای** تۆ)؛ ٨) رکێف؛ ٩) بن‌و خوارو: (لە**پا**ی دیواران)؛ ١٠) کەوابیّ: (**پـا** ژمـەرا چیّ‌نابت)؛ ١١) وشـەی سەیرمـان، پەحـا: (**پا**! عەجیبـە)؛ ١٢) خاویّن، پاك: (شـوتم، **پا** بوّتەوە)؛ ١٣) تیّکوّل: (ئەم خیارەم بوّ**پـا**کـە) [ف] ١) پا؛ ٢) برابـر؛ ٣) پایە، درجە؛ ۴) اندازە؛ ۵) حریف در قُمار؛ ۶) تلنگر؛ ٧) عُهدە؛ ٨) رکاب؛ ٩) پایین، بُن؛ ١٠) پس؛ ١١) حرف تعجُّب؛ ١٢) پاك؛ ١٣) پوست، پوستە.

**پائەوشار:** دەپی ژێرقاچی جوّلاّ [ف] پای افشار جولاهی.

**پابـونـەوە:** ١) لەناوچون، رویشتن‌و نەمان: (ئوّخەی لیّرە **پابوّوە**)؛ ٢) بریەتی لەمـەرگی بەدفـەڕ: (کەنگیّ ئەوزاڵمە **پا** دەبیّتەوە)؛ ٣) خاویّن کردنەوە: (چەندی دەیشوّم **پا** نابیّتەوە)؛ ۴) خەلاس بون لەئەرك [ف] ١) از میان رفتن؛ ٢) کنایە از مرگ دشمن؛ ٣) پاکیزە شُدن؛ ۴) فراغت یافتن.

**پابەرە:** دەرپیّ [ف] تُنبان.

**پابەند:** ١) پیّوەند، بەندی ئاسنی قاچی یەکسم؛ ٢) گویّ پیّدان‌و ئیلاقە: (بەهیچ شتیّ **پابەند** نیم) [ف] ١) کندپای زندانی؛ ٢) پای‌بند، تعلّق.

**پابەوەخت:** کیژەعازەوی دەزگیراندار [ف] دم بخت.

**پابیّل:** بڕشتی یەك پیّمەڕە [ف] برش یکبار بَیل زدن.

**پاپ:** تلّفی شتی تراو [ف] دُردی.

**پاپا:** ١) زوّر بەتاسەو داواکار؛ ٢) باپیر؛ ٣) مەزنی خاچ‌پەرستان؛ ۴) پیّ لەزمانی منالاّندا [ف] ١) آرزومند؛ ٢) پدربزرگ؛ ٣) پاپ؛ ۴) پای در لغت بچەگانە.

**پاپاجانە:** کەوشی منالاّن، پاپوچە [ف] پاپوش بچّە.

**پاپاچینە:** ١) پیّ پیّلکەی کەرێزکەن کە لەدیواری دەکوّلّیّ؛ ٢) نەردیوان، پەیژە [ف] ١) پلکان قنات؛ ٢) نردبام.

**پاپاخ:** کلاّوی عەجەمی [ف] نوعی کُلاە.

**پاپاغ:** پاپاخ [ف] نوعی کلاە.

**پاپریك:** جوّریّ پەپولە [ف] نوعی پروانە.

**پاپل:** وردە لکی دار [ف] جوانە درخت.

**پاپلەکانیّ:** جوّریّك جوّلانەی گوریس [ف] نوعی تاب.

**پاپوّڕ:** گەمیە، کەشتی [ف] کشتی.

**پاپوّڕوان:** گەمی‌وان [ف] ناخُدا.

**پاپوّڕەوان:** گەمیەوان، پاپوّڕوان [ف] ناخُدا.

**پاپوچە:** کەوشی منالاّن [ف] کفش بچەها.

**پاپوش:** ١) پیّلاّو، پالاّ؛ ٢) دەرپیّ [ف] ١) پای‌افزار؛ ٢) تُنبان.

**پاپەتی:** پیّخواس، بیّ‌پیّلاّو، خواس [ف] پابرهنە.

**پاپەجانە:** پاپاجانە [ف] کفش بچە.

**پاپەل:** بن‌گەلاّ، بن پەلك [ف] برگ زیرین.

**پاپەنجە:** پەیژە، سلەم، ناردیوان [ف] نردبام.

**پاپەی:** زوّر داواکار، پاپا [ف] بسیار خواهان و طالب.

**پاپی:** ١) جاسوس، زوانگیر، شوفار؛ ٢) دەمەقاڵە، بنار [ف] ١) جاسوس؛ ٢) جدال لفظی.

**پاپیا:** بەپای پیادە، بەپیّ‌یان [ف] پیادەرفتن.

**پاپیارەتە:** ڕوّیشتن بە پیادەیی، پەیامە شین [ف] پیادە رفتن.

**پاپیاسـاوین:** ١) پیّ خوست کردن؛ ٢) بریّتی لە چاوپـوّشی کردن‌و سەرپوّش لەسەردانان [ف] ١) لَگدکوب کردن؛ ٢) کنایە از پوشیدن و ماست‌مالی کردن.

**پاپیانان:** پیّ‌لیّ‌نان، پیّخوست کردن [ف] لگدکوب کردن.

**پاپی سلّیمونی:** پەپوسلّیمانە [ف] شانەبسر، هُدهُد.

**پات:** نەبدوّڕانی شەترنج [ف] اصطلاح مساوی در شطرنج.

**پاتاڵ:** ١) ئاژاڵ، ولّسات؛ ٢) کوّنەپەڕوّ؛ ٣) روتی بیّ‌بەرگ؛ ۴) بیّکارە؛ ۵) پیری لەکار کەوتو [ف] ١) دام اهلی؛ ٢) کهنە پارچە؛ ٣) برهنهٔ فقیر؛ ۴) لَش و بیکارە؛ ۵) پیر و فرتوت.

**پاتاوە:** پالاّ، پیّلاّو، کاڵە، کاڵك [ف] پاتابە.

**پاتشا:** لەقەمی شاو سولّتان [ف] پادشاە.

**پاتك:** ١) پشت مل، بۆق‌مل؛ ٢) چەپكێ لەگەڵاتوتن؛ ٣) پارچەپینە؛ ۴) پشتەسەر ف ١) پس گردن؛ ٢) دسته‌ای از برگ توتون؛ ٣) وصلهٔ قماش؛ ۴) قفا.

**پاتك‌پان:** مل‌قەوی، مل‌ئەستور ف گردن کُلُفت.

**پاتن:** ١) برژان، بێژان؛ ٢) سوتان، شەوتین ف ١) بریان شدن، پختن؛ ٢) سوختن.

**پاتۆ:** ١) کۆلوی‌نان، هەویری لەتەندورا سوتاو؛ ٢) کولێرە؛ ٣) کلوەبەفری درشت ف ١) خمیر در تنور سوخته؛ ٢) گرده نان؛ ٣) دانه برف دُرشت.

**پاتۆز:** ماشێنی دروێنە ف ماشین دِرَو.

**پاتۆف:** گیایەکە وەك قاشاغ یەکسمی پێ‌دەماڵن ف گیاهی است بُرس مانند.

**پاتۆق:** شوێنی کۆم بونەوە ف پاتوق.

**پاتۆل:** شەڵوار، شەرواڵ، پانتۆن، رانکی لەقوماش ف شلوار.

**پاتۆڵە:** کولێرە، ستورك، ئەستورکە ف گرده نان.

**پاتە:** ١) کەوشی چەك‌و شڕ؛ ٢) کەوشی لاستیك، گالۆش؛ ٣) دوبارە؛ ۴) ورتکەنان؛ ۵) بەرماو ف ١) کفش کهنه و پاره؛ ٢) گالُش؛ ٣) دوباره؛ ۴) ریزه نان؛ ۵) نیم‌خورده، پس‌مانده.

**پاتەتە:** پینەی کەوش ف وصلهٔ کفش.

**پاتەخت:** شاری ناوەندی، پایتەخت ف پایتخت.

**پاتەخۆر:** ١) بەرماو خۆر؛ ٢) بریتی لەپیاوی خۆفرۆشی خوێڕی‌و سەرسواڵکەر ف ١) ریزه‌خوار خوان مردم؛ ٢) کنایه از خودفروش گدامنش.

**پاتەران:** وڕاوە ف هذیان گفتن در خواب.

**پاتەی:** هەڵ پەرتاوتنی دار ف هَرَس درخت.

**پاتێل:** مەنجەڵی پچوك، بەرۆشی گچکە ف دیگِ کوچك.

**پاتیلە:** پاتێل ف دیگ کوچك.

**پاجقە:** وەرگێران، تەرجەمە ف ترجمە.

**پاجۆش:** لکی لەبنی‌دار دەرچو ف جوانهٔ از پای درخت.

**پاچ:** ١) بڕین بەقەیچی؛ ٢) قەزمە، کولێنگی یەك‌دەم؛ ٣) پەڕاندن بەتیخ: (دای‌پاچە)؛ ۴) ماچ، راموسان ف ١) برش با قیچی؛ ٢) کلنگ؛ ٣) قطع چیزی با تَبر یا تیغ؛ ۴) بوسه.

**پاچاڵ:** پێچاڵ، قوڵکەی ژێر پای جۆلا ف پاچال.

**پاچرا:** پێچرا، پێچکی لەدار یان لەقوڕ بۆ قوتیلکەچرا ف پاچراغ.

**پاچڕکێ:** لەسەر پەنجەو بێ‌هەست رۆیشتن ف پاورچین.

**پاچقە:** پاجقە ف ترجمە.

**پاچکاری:** زەوی کۆڵین بەقازمە ف کلنگ کاری.

**پاچکرن:** ماچکردن، راموسین ف بوسیدن.

**پاچکە:** ١) پێچك، پایە؛ ٢) کەللەپاچە، سەروپێ ف ١) پایە؛ ٢) کلّه‌پاچه.

**پاچلە:** سنگی تەنافی رەشماڵ ف میخ رسن سیاه‌چادُر.

**پاچولکە:** قەزمەی پچوك، پاچەکۆڵە ف کلنگ کوچك.

**پاچە:** ١) کەللەپاچە، سەروپێچك؛ ٢) پەڕۆ ف ١) کَلّه‌پاچه؛ ٢) کهنه.

**پاچەچی:** سەدلك‌و پێچك‌فرۆش بەکوڵاوی ف پاچه‌فروش.

**پاچەقە:** پاجقە ف ترجمە.

**پاچەقولێ:** ١) جومگەی پا، بەرگوێزنگ، سەری قولەقاپە؛ ٢) پێ‌لە پێ پێچان لە زۆراندا ف ١) مُچ پا؛ ٢) لُنگ کردن در کُشتی.

**پاچەك:** تەپاڵە، ریخی وشکەوەبو ف تَپاله.

**پاچەکۆڵە:** پاچولکە ف قزمهٔ باغبانی.

**پاچین:** ١) پەڕاندن؛ ٢) خوارکردنەوەی بزمارو... ف ١) پی کردن، برش؛ ٢) پرچ دادن.

**پاچینە:** پاپەنجە، نەردیوان ف نردبام.

**پاخ:** پارچەی کۆنە، پەڕۆ ف وصلهٔ کهنه.

**پاخان:** خۆهەڵکێشان‌و شات‌وشوت، لەدوای وشەی چاخان دێت ف چاخان.

**پاخر:** مس ف مس.

**پاخراو:** پێخواس، پێخاوس، پاپەتی ف پابرهنه.

**پاخرکەر:** مسگەر ف مِسگَر.

**پاخستن:** ١) لەپێ‌کەوتن، زۆر ماندوبون لەرێگەدا؛ ٢) زۆر نەخۆش‌و کەلەلا کەوتن ف ١) ازپا افتادن و بریدن در راه؛ ٢) از شدت بیماری نا نداشتن.

**پاختە:** کەڵەك، مەکر، فریو ف حیله.

**پاخل:** ١) باخەڵ؛ ٢) گیرفان، بەریك ف ١) بغل؛ ٢) جیب.

**پاخوا:** ١) پێخوێ، ئەندازەیەك قوڕ بۆ رۆژە سواغێك؛ ٢) ئەوکلۆشەی خراوەتە بەرپێ بۆ گێرەکردن ف ١) مقدار کاه‌گل آمادهٔ یك روز کار؛ ٢) خرمن نیم‌کوب شده.

**پاخۆشە:** پێخوست، لەبەرپێ‌دا وردبو، بەرپێ‌دراو ف لگدمال شُده.

**پاخەسو:** بەربوك ف ینگه.

**پاخێل:** عەرابەی لادێ ف عرادهٔ دهاتی.

**پادار:** ١) جانەوەری خاوەن پا؛ ٢) کۆتەرەدار؛ ٣) پایەدارو بەرقەرار ف ١) ضِد خزنده؛ ٢) تنهٔ درخت؛ ٣) برقرار و پایدار.

**پادارانە:** باجێ کەبۆ لەشکرکێشی لەخەڵکی‌دەستێنن ف باج لشکرکشی.

**پاداری:** میوەی باوەرێن ف پادرختی.

**پاداش:** قەرەبو، سزا، تۆڵەی چاکە ف پاداش.

**پاداشت:** پاداش ف پاداش.

**پاداگرتن:** پێ‌داگرتن، سوربون لەسەر کارێ ف اصرار ورزیدن.

**پادان:** پێ‌لێ‌دان، تێ هەڵدان ف تیپازدن.

**پادانەگەز:** پاداگرتن ف نگا: پاداگرتن.

**پاداو:** ١) تەڵە، تەپکە؛ ٢) چەرمێکی بەئاڵقە لەقاچی دەبەستن بۆ بەدار هەڵچون ف ١) دام، تله؛ ٢) حلقهٔ چرمی که بپای بندند و از درخت بالا روند.

**پادسن:** تازە پیر ف نوپیر.

**پادشا:** پاتشا ف پادشاه.

**پادەشت:** پێ‌دەشت، بەرداوێنی چیا ف دامنۀ کوه.
**پادەشتی:** دەشتی بەرکێو ف جلگۀ دامنۀ کوه.
**پادینگ:** سندوڵ، بەشە قوڵەکەی دینگی چەڵتوك ف شالیکوب.
**پار:** ۱) ساڵی پێشـــو؛ ۲) بەش، پاژ؛ ۳) کلافـەدەزو؛ ۴) نیمـەی پاش: (پارشەو)؛ ۵) پوش، لەوەڕ ف ۱) پارسال؛ ۲) قسمت، جزء؛ ۳) کلافه نخ؛ ۴) نیمۀ دوم؛ ۵) کاه.
**پارازتن:** ئاگاداری کردن ف نگهداری.
**پاراستن:** پارازتن ف نگهداری کردن.
**پاران گوێن:** گوێلپار، پارێنە ف گوسالۀ پارینه.
**پاڕانەوە:** لالانەوە، بەزەلیلی و زەبونی داوا کردن ف لابه و التماس.
**پاراو:** ۱) تێراو؛ ۲) شەق و تورت و لەگەشە ف ۱) سیرآب؛ ۲) شاداب و خرم.
**پارپار:** گیای پرپرە، پەلپینە ف گیاه خرفه.
**پارت:** دەستە، کۆمەڵ ف گروه، دسته.
**پارتی:** لایەنگری بەدەستەلات ف پارتی.
**پارچ:** ۱) گاسن؛ ۲) قەزمە، پاچ؛ ۳) بەم‌جۆرە ف ۱) گاوآهن؛ ۲) کلنگ؛ ۳) اینطور.
**پارچە:** ۱) پاژ، لەت؛ ۲) کوتاڵ، قوماش ف ۱) پارچه؛ ۲) قماش.
**پاردو:** پاڵو، ئەوئالقە یا ئەوگوریسە کەبن کلکی یەکسم دەگری ف پاردُم.
**پاردە:** ۱) سیپـە، حەشـارگە، رەبەت، بۆسەی راوکەر؛ ۲) خەندەك؛ ۳) دیواری کورت ف ۱) کمین شکارچی؛ ۲) خندق؛ ۳) دیوار کوتاه.
**پارزن:** پاڵوێنە، راوك ف پالونه.
**پارزنگ:** پارزن ف پالونه.
**پارزون:** پارزن ف پالونه.
**پارزونگ:** پارزن ف پالونه.
**پارسو:** پەراسو ف دنده.
**پارسوستور:** برێتی لەبەفیز ف کنایه از متکبّر.
**پارسە:** سواڵ، گەدایی، خوازەلۆکی ف گدایی.
**پارسەك:** سواڵکەر، گەدا، خوازەلۆك ف گدا.
**پارســەنگ:** ۱) کۆمەگی بەردی تەرازوی سوك؛ ۲) تۆزێ گران کردنی تەرازولەبەرخاتری کڕیار ف ۱) پارسنگ ترازو؛ ۲) خاطرانۀ مُشتری.
**پارشەو:** ۱) نیمەی دوهەمی شەو؛ ۲) دوهەم شێوی ڕۆژوەوان، پارشێو ف ۱) بعد از نصف شب؛ ۲) سحری.
**پارشێو:** پارشەو ف سحری.
**پارکە:** کەرد، تەختەی چێندراو، دوکان، کەردو ف قطعه زمین کاشته شده.
**پارکـەر:** ۱) کلافـەکر، تەختـەیەکـە سێ قوچکەی تێ بڕاوە، کەلافی دەزوی لەسەر هەڵدەکەن؛ ۲) بەش‌کەر ف ۱) کلافه‌گیر؛ ۲) تقسیم‌کننده.
**پارکوڵە:** بێچوی دوساڵەی ورچ و بەرازو... ف بچۀ پارینۀ خرس و گراز و...
**پارگوڵ:** پارگوێر ف گوسالۀ پارینه.
**پارگوێر:** گۆلکی پار، بەچکەچێلی دوساڵە، پارێن، پانێر ف گوسالۀ پارینه.

**پارگوێل:** پارگوێر ف گوسالۀ پارینه.
**پارگە:** پارکە ف کرد کشاورزی.
**پارگیر:** پارکەر، کلافەگر ف کلافه‌گیر.
**پارگین:** ۱) پارزن؛ ۲) پاروێنیك ف ۱) پالونه؛ ۲) نگا: پاروێنیك.
**پارگێن:** پارزن ف پالونه.
**پارو:** ۱) ئەوپـارچە خۆراکەی بۆجارێك ئەیخەنە دەم، تیکە، لوقمە؛ ۲) پارچە، بەش ف ۱) لقمه؛ ۲) جُزء.
**پاڕۆ:** بێڵی دارین ف پارو.
**پاڕۆکڵە:** جێشتێ کەبەخۆشی پێ گرتنی منال دەکرێتە خێر ف غذایی که بەمناسبت پاگرفتن بچه داده می‌شود.
**پاروگلێن:** پاروزل، لوقمـە گەورە، فرەخۆر، گەپ‌تیکە ف لقمه بزرگ، کنایه از پُرخور.
**پاروێنە:** مریشك و مراوی و بوقلەی دوساڵە ف ماکیان دوساله.
**پارونەك:** پارگوێر ف گوسالۀ پارینه.
**پاروێنیك:** خەندەکی دەوری ماڵ ف جوی اطراف خانه.
**پارە:** ۱) پوڵ، دراو، پەرە؛ ۲) پاژ، پارچە، لەت؛ ۳) شڕ و دڕاو؛ ۴) ئەوێ، بەرانبەری ئێرە؛ ۵) کەمترین دراوی تورکان: (قیمەتی ماچی دوسەد کیسەیی ساغەو نیمە / غەیری یەك کیسەیی سەد **پارە** لە گیرفانمدا) «نالی» ف ۱) پول؛ ۲) جُزء؛ ۳) پاره؛ ۴) آنجا؛ ۵) کمترین مبلغ پول تُرکی.
**پارەپەرەست:** ڕەزیل، ڕژد ف خسیس.
**پارەپیس:** چروك، ڕژد، دەس قوچاو، چکوس، ڕەزیل ف خسیس.
**پارەدار:** دەوڵەمەند، پوڵدار، دارا ف پولدار.
**پارەموڵ:** دەوڵەمەند، زەنگین، پارەدار ف پولدار، ثروتمند.
**پاڕەوکـە:** منـاڵێ باش بەرێدا بڕوا: (شوکر **پاڕەوکە** بوە)، پێڕەوکە ف بچۀخوب پاگرفته.
**پارهەڵکەر:** پارکەر ف نگا: پارکەر.
**پاری:** پارو، تیکە ف لُقمه.
**پاڕیان:** پاڕانەوە ف لابه‌کردن.
**پاڕیانەوە:** پاڕانەوە ف لابه و خواهش.
**پاریخـۆر:** بریتی لە خۆفرۆش بەبێگانە، چڵکاوخۆر، بێگانەپەرست ف پَست و بیگانه‌پرست.
**پارێز:** ۱) پەهـەرێز، لەهێنـدێ خۆراك دەم‌گرتنەوە؛ ۲) خۆ پاراستن؛ ۳) هجوم لە نخافڵ؛ ۴) بێستانی تەرەکاڵ؛ ۵) بۆسە، کەمین ف ۱) برهیز؛ ۲) دوری کردن؛ ۳) یورش غافلگیرانه؛ ۴) پالیز؛ ۵) کمین.
**پاریزان:** تورەکەی پشت ف توبره پشت کشاورزان.
**پارێزبـردن:** لەنخافڵ و بەهێواشی بۆچون، هجوم کردن ف غافلگیرانه هجوم بُردن.
**پارێزچون:** خۆ مەلاس کردن لەناو ڕێبەتدا ف در کمین نشستن.
**پارێزدار:** ئاگادار، لایەنگر، داژدار ف هوادار، طرفدار.
**پارێزڤان:** بێستانەوان ف پالیزبان.
**پارێزکردن:** خۆ دورخستن لەخۆراك یا لەکەسێ ف پرهیزکردن.

**پاریزگا:** ۱) حەشارگەی راوچی؛ ۲) مەلبەندیکی گەورەی دەولەتی، ئەستان، ویلایەت: (پاریزگای هەولیر) ف ۱) کمین شکارچی؛ ۲) اُستان.

**پاریزگار:** ۱) دیندارو لەخوا ترس؛ ۲) کەسی کەدەتوانی بپاریزی: (پاریزگارت خوابی) ف ۱) پرهیزکار؛ ۲) مُحافظ.

**پاریزگە:** پاریزگا ف نگا: پاریزگا.

**پاریزنای:** پاراستن ف نگهداری.

**پاریزەر:** ۱) کەسی پیاو دەپاریزی؛ ۲) وکیلی دادگا، محامی، ئاوقاتی ف ۱) حامی؛ ۲) وکیل دادگستری.

**پاریف:** گوشتی پیشاو لە تەندوردا ف گوشتِ در تنور تفیده.

**پارین:** گویلپار، پارگویل، پارگویر، پانیر ف گوسالهٔ پارینه.

**پارینە:** پارین ف نگا: پارین.

**پارینەوە:** پارانەوە ف لابە و خواهش.

**پاز:** ئاگاداری، ئیشك، پاس ف نگهبانی، پاس.

**پازار:** ۱) بەردیکە بەزور رەنگان، بوخشل دەبی؛ ۲) روژی یەکشەممە: (روژی یەکشەممە کە مەشهورە بەروژی **پازار**) «شیخ رەزا» ف ۱) سنگ گرانیت؛ ۲) یکشنبه.

**پازدە:** دەو پینج ف پانزده.

**پازدەمین:** ژمارەی نوبەتی بو پازدە ف پانزدهم.

**پازدەهەم:** پازدەمین ف پانزدهم.

**پازدەهەمین:** پازدەمین ف پانزدهم.

**پازدەیەم:** پازدەمین ف پانزدهُم.

**پازگا:** جیگەی ئیشك گرتن ف پاسگاه.

**پازگر:** جەزایەرچی، کیشك‌چی ف پاسدار.

**پاژماله:** مالی خزمەتکار لەخانوی ئاغادا، ژیرماله ف خانهٔ نوکر در منزل ارباب.

**پازناو:** مەلغەی بەرداش هەلینان ف اهرُم سنگ آسیا برداشتن.

**پازناوك:** پازناو ف نگا: پازناو.

**پاژ:** ۱) بەش، بەشیك‌لەروژیك؛ ۲) بەلگە، دەلیل ف ۱) جُزء؛ ۲) سند و دلیل.

**پاژنو:** پانیەی پا، پاژنە ف پاشنه.

**پاژنە:** پاژنو ف پاشنه.

**پاژنەکیش:** کەرەتە، پارچیکی لوسی پیلە، بو دەپی کردنی کەوشی تەنگ دەکار دەکری ف پاشنه‌کش.

**پاژنەهەلکیش:** پاژنەکیش ف پاشنه‌کش.

**پاژنە دەرگا:** بن ریسمانە، ئەو قولکە دارەی دەرگای لەسەر دەگەری بو کرنەوەو داخستن ف پاشنهٔ در.

**پاژوخ:** وەرام، پەرسف، جواب، جوال ف پاسخ.

**پاژەرەژ:** شکوفەی گەلاگویز ف جوانهٔ برگ گردو.

**پاژی:** کەم، جوزئی ف جُزئی.

**پاژینە:** ۱) کەپەکی ئارد؛ ۲) بنژیلی گەنم ف ۱) نُخاله گندم؛ ۲) تهِ غربال.

**پاس:** ۱) پاز، ئاگاداری؛ ۲) پسولەی رنگەدان بو سەفەر ف ۱) پاس؛ ۲) اجازهٔ سَفَر.

**پاسا:** ۱) وەشارتو، بەرپیوار، نادیار؛ ۲) چاوپوشی؛ ۳) سەرپوش؛ ۴) داپوشەر، گوم کەر، وەشیر؛ ۵) پی لەعەرز خستن، پا بەزەوینا ساوین ف ۱) پنهان؛ ۲) چشم‌پوشی؛ ۳) سر پوش؛ ۴) پنهان کننده؛ ۵) پا بر زمین ساییدن.

**پاس پازوك:** هەلەپەزە، پس‌پسەکولە ف نوعی عنکبوت.

**پاساپورت:** بەلگە ئیجازەی سەفەر، لەدەولەتی بو دەولەتی ف پاسپورت.

**پاسادان:** توژینەوە، لی وردبونەوە ف پژوهش.

**پاسار:** ۱) لیوارەی بان؛ ۲) پەند پیدانو تەمی کاری ف ۱) لب بام؛ ۲) درس عبرت.

**پاسارە:** لیوارەی بان، پاسار، گوی سوانە، سوانە ف لبِ بام.

**پاساری:** چولەکەی ناو ئاوایی، چقیك، چیشکە ف گُنجشك.

**پاسپورت:** پاساپورت ف پاسپورت.

**پاسفندە:** گەندەل، رزیو: (ئەمدارە **پاسفندە** بوە) ف پوسیده.

**پاسقالی:** تیز، تانە، گالتەپی‌کردن، قەشمەری، تەقلیت ف مَسخره.

**پاسکردن:** ۱) کیشك گرتن؛ ۲) وەرینی سەگ، رەوینی سە ف ۱) پاسداری کردن؛ ۲) پارس سگ.

**پاسگا:** پازگا ف پاسگاه.

**پاسگر:** کیشك‌چی، جەزایرچی ف پاسدار.

**پاسگە:** پازگا ف پاسگاه.

**پاسوخ:** پاژوخ، جواو، جواب ف پاسخ.

**پاسە:** ئاوەها ف اینطوری.

**پاسەبان:** پاسگر ف پاسبان.

**پاسەرنیان:** سەردەدونان، شوین کەوتن ف تعقیب کردن.

**پاسەوان:** پازگر ف پاسبان.

**پاسەوانی:** ئیشك‌گرتن، کیشك‌کیشان ف نگهبانی.

**پاش:** ۱) دواوە؛ ۲) بریتی لەقنگ؛ ۳) پاشگری بەواتا پرژین: (ئاوپاش) ف ۱) پَس مُقابل پیش؛ ۲) کنایه از مقعد؛ ۳) پسوند به‌معنی پاشنده.

**پاشا:** ۱) لەقەمی مەزنی ئیران؛ ۲) لەقەمیکی تورکی بو پیاوە گەورەکانیان ف ۱) پادشا؛ ۲) لقب بزرگان ترك.

**پاشا پاشایین:** میرمیرین، گالتەیەکی هەموانیو دەستەجەمعی لەکوردستان ف یکی از سرگرمیهای گروهی در کُردستان.

**پاشاخور:** بەرماوی ئاژەل لە قەسەلو ئالف ف پس‌ماندهٔ عَلَف.

**پاشاراو:** ئاراو، کەفاوی جاریك جل تیدا شوراو ف پس‌آب رختشوئی.

**پاشارو:** پاشەروك، میوەی پاش چنینی لەباغ بەجی‌ماو ف پساچین.

**پاشاگەردانی:** بریتی لەتیکەل پیکەلیو هەرکەس هەرکەس ف هرج‌ومرج و بی‌قانونی.

**پاشام:** پارشیو، دواشیوی روژوگر ف سحری.

**پاشان:** لەوەبەدوا، دوایی ف بعداً.

**پاشایەتی:** ۱) لە پلەی پاشادا بون؛ ۲) بریتی لە کەیف‌سازیو تەیاری: (**بەپاشایەتی** دەژی) ف ۱) شاهی؛ ۲) کنایه از خوشگذرانی.

**پاشباره:** دەستەندو، جیّ دەسگرەی جوتێر لەئامور ف دەستگیرۀ خیش.

**پاشبەن:** پێوەندی پاشوی یەکسم ف پابند ستور.

**پاش بەند:** پاشبەن ف پابند ستور.

**پاشتەرك:** بەشی لای کلك لەکورتانو زین ف جای خُرج در زین.

**پاشتەرکی:** باری پاشتەرك ف بار دنبالۀ زین.

**پاشتیلانە:** سێ رۆژانەی بوك هێنان ف جشن سەروزۀ عروسی.

**پاشخان:** وچخانە، خەلوەتی، ژوری کەلوپەل لەپشت ژوری دانیشتن ف پَستو.

**پاشخستن:** گویّ نەدان، خولیّ گێل کردن، وەدرەنگ خستن ف اهمال کردن.

**پاشخوان:** بەرماو ف ماندۀ خوراك.

**پاشخوانە:** پاشخوان ف ماندۀ خوراك.

**پاشـدار:** کەسیّ یاکـەسـانیّ کە لەدوای لەشکـرەوە دەرۆن. بەرانبەری پێشەنگ ف دنبالەرو لشکر، مقابل طلایە.

**پاشدز:** دزیّ کەپاسی دزان دەدێریّ ف دُزد پاسدار دُزدان.

**پاشدزە:** پاشدز ف نگا: پاشدز.

**پاش رۆ:** بەرانبەری پێشەنگ، ئەو چەکدارانەی لە دوای لەشکرەوە دەرۆن ف پس قراول.

**پاشقل:** گردەوە کویی. لەدەم گێرانەوە، لەشتیّ شتیّ وەلانان، پاشەکەوت ف صرفەجوئی.

**پاشقل دان:** گێرانەوە: (ئاخری هێندێکی **پاشقل دا**) ف اندوختن.

**پاشقول:** ١) پیّ لەپیّ پێچان لە زۆرەوانیدا؛ ٢) پاشقل ف ١) لُنگ کردن در کُشتی؛ ٢) پس انداز.

**پاشکـۆ:** هەگبـە، خورجێکی پچـوکـە کە لەدوای زین لەسـەر تەرکی دادەبەستن ف خُرج کە بر ترك اسب بندند.

**پاشکـەوان:** ١) پاشـدز؛ ٢) فیشەك فڕیّ دەرەوەی تفەنگ ف ١) نگا: پاشدز؛ ٢) فشنگ انداز تفنگ.

**پاشکەوتن:** لەدوامان، بەجێمان ف واماندن.

**پاشکەوتو:** بەجیّ ماو ف جاماندە، واماندە.

**پاشکەوتە:** بەجیّ ماو، سەرنەکەوتو ف واماندە.

**پاشگـر:** لەرێزمـانـدا بەوپیتانە دەلێن کە دەکەونە دوای وشەوەو مانایان دەگۆڕن ف پسوند.

**پاشگەز:** پەشیمان، پێژەوان ف پشیمان.

**پاشڵ:** ١) بەشی خوار کەمەر لە پشتەوە؛ ٢) باخەڵ؛ ٣) لاڕان لە دواوە؛ ٤) پاڵوی بەزەنگوڵە؛ ٥) قافیەی شیعر، وشەی دوای نیوە شیعر ف ١) از کمـر بپـایین از پُشت؛ ٢) بغل؛ ٣) عقب ران؛ ٤) پالدُم زنگدار؛ ٥) قافیۀ شعر.

**پاشمار:** شکایەت لێکراو ف مُدّعیٰ علیە. شکایت از او شده.

**پاشمـارە:** پاشماڵە، ماڵیّ کە خزمەتی ماڵەگەورە دەکاو لەوێش ماڵی پیّ دراوە ف خدمتکار کە با خانوادە در خانۀ ارباب است.

**پاشماشە:** فیشەك فڕیّ دەرەوە، پاشکەوان ف فشنگ انداز تفنگ.

**پاشماگە:** کەلەپوور، میرات ف میراث.

**پاشمـاڵـە:** ١) ئەومـاڵـەی لەگەڵ خێل بۆهـەوار دەچن و لەبەر نەداری خزمـەتیان دەکەن؛ ٢) پاشمارە، ژێرماڵە ف ١) خانەای کە با ایل بە ییلاق رود از فقر خدمتکار آنان شود؛ ٢) نگا: پاشمارە.

**پاشمامان:** ژنیّ کە لەمناڵ هێناندا یاریدەی مامان دەدا ف کمكِ ماما.

**پاشماوە:** ١) ئەوی لەبەرشتیّ مابێتەوە، باقی، بەرماو؛ ٢) زیندوی کەس و کار مردو ف ١) باقیماندە؛ ٢) تنها بازماندە.

**پاشملە:** خراوگوتنی کەسی نەدیار، لەپشت سەرەوە خوێندن، غەیبەت ف غیبت.

**پاشمەرگە:** مناڵیّ پاش مەرگی باوك بێتە سەردنیا ف بچەای کە بعد از مرگ پدر بدنیا بیاید.

**پاشمەندە:** باقی ماو ف باقیماندە.

**پاشمەنە:** پاشمەندە ف باقیماندە.

**پاشن:** دوایی، دوماهی: (رۆژا **پاشن** گەهامە) ف پَسین.

**پاشنی:** پاژنە، پانیە ف پاشنە.

**پاشنی کەش:** پاژنەکێش، کەرەتە ف پاشنەکش.

**پاشو:** دوپەلی دواوەی یەکسم ف پای ستور.

**پاش و پێش:** بەرودوا ف پس و پیش.

**پاشۆرە:** ئاوی گەرمی دەرماناوی کەقاچی نەخۆشی پیّ دەشۆن ف پاشویە.

**پاشۆڵ:** پاشڵ ف نگا: پاشڵ.

**پاش وەچە:** نەوەو نەوی چڕك ف نبیرگان.

**پاشوەن:** پاشبەند ف پابند حیوان.

**پاشەبەرە:** ١) پاشەرۆك؛ ٢) برێتی لە دوامین فرزەند ف ١) پساچین؛ ٢) کنایە از آخرین فرزند.

**پاشەخورج:** پاشتەرکی، هەگبە ف خرج اسب.

**پاشەدزە:** پاشدز ف نگا: پاشدز.

**پاشەرۆژ:** لەوەدوا، ئایندە، رۆژانی دوایی ف آیندە.

**پاشەرۆك:** پاشارۆ، میوەی بەجیّ ماو، دوای باغ ڕنین ف پساچین.

**پاشەکەفت:** کۆوە کردن، پاشقل ف پس انداز.

**پاشەکەوت:** پاشەکەفت، گلدرياوە ف پس انداز.

**پاشەکەوتی:** گلۆدراو ف پس انداز.

**پاشەکی:** لەدوایی پارەدان، بەرانبەر بەیعانە ف پَسادَست.

**پاشەڵ:** جلی سەرپاشڵ، بەرگی پاشل، دواوەی داوێن ف قسمت عقبی دامن.

**پاشەلەقە:** بەتەنبەڵی رۆیشتن ف سلانەسلانە.

**پاشـەوانـە:** صندوقیّ لەپلورەی هەنگا بۆشانە تێدا هەڵبەستن ف جعبۀ چوبین برای شانەگذاری زنبور.

**پاشەوپاش:** پشتەو ڕو ف وارونە، پشت و رو.

**پاشی:** ١) لەدوای؛ ٢) پاشو؛ ٣) دوایە، پاشان ف ١) بعداً؛ ٢) پای ستور؛ ٣) بعد از، پس از.

**پاشێل:** پیّ خوست، بەرپیّ دراو، بەپاکوتراو ف لگدمال.

**پاشین:** هەرەدوا ف واپسین.

**پاشێو:** پارشێو ف سحری.

**پاڤك:** پیفۆك، کیفۆك، گیایەکە بنەکەی دەبرژێنن یان دەکوڵێننو دەیخون ف گیاهی پیازدار و خوردنی.

**پاق:** لینگ، لاق، قاچ ف لِنگ، پاعموماً.

**پاقاوێژ:** ئەوەی کەلەرێ رویشتندا قاپ لەقاپ دەدا ف چهارپای سگدست.

**پاقر:** ۱) مس؛ ۲) ژەنگی مس، پاخر، باقر ف ۱) مس؛ ۲) زنگار مس.

**پاقژ:** پاك، خاوێن، تەمیس ف پاکیزە.

**پاقژە:** پەلەقاژە، لەتاوان یان بۆدەرەتان بەدەستو پێ تێکۆشان ف دست و پازدن.

**پاقلانچکە:** گیایەکی رەوانەو گەڵای ددانەدارە ف گیاهی با برگهای کنگرەای.

**پاقلاوە:** شیرنیەکە بەناوبانگ، باقلاوا ف باقلوا.

**پاقلە:** باقلە، دانەوێڵەیەکە دەکلودا پەروەردە دەبێ ف باقلی.

**پاقلیر:** گوێزی فەریکی تێکوڵ لێ دارناو ف گردوی تر پوست کندە.

**پاقلینچکانە:** گیایەکە لە پرپرە دەکا ف گیاهی است شبیه خرفه.

**پاقولاغ:** سمی حەیوانی دوسم ف سُم حیوان جُفت سُم.

**پاك:** ۱) خاوێن، پاقژ، پاکژ، تەمیز؛ ۲) گش، هەمو، تەواو؛ ۳) باش، پەسند، خو، چاك ف ۱) پاکیزە؛ ۲) همە؛ ۳) خوب.

**پاکار:** شاگرد وەستا، بەردەست، خوڵامی هەمیشە ئامادە ف پاکار.

**پاکان:** پیاوچاکان، شێخو مەشایخ ف نیکان.

**پاکانە:** تۆمەت لابردن: (**پاکانەی** خۆم کرد، **پاکانەی** کردم) ف تبرئه.

**پاکایی:** جێگەی نەپیس لە زەوین ف جای تمیز در زمین.

**پاكبونەوە:** پابونەوە ف نگا: پابونەوە.

**پاکتاو:** بێ گەرد، خاوێن، پاقژ ف پاکیزە.

**پاکـرانەوە:** زۆرچون بۆ شوێنێ: (**پای کراوەتەوە** هەمو رۆژ سەرمان لێ دەدا) ف بسیار به خانەای رفتن و مزاحم شُدن.

**پاکردن:** ۱) تێکوڵ لێ کردنەوە؛ ۲) کورتهێنانی تیر یا بەرد لە ئامانج، بەرکردن ف ۱) پوسته کندن؛ ۲) پایین هدف زدن.

**پاکـــردنـــەوە:** ۱) خاوێن کردنـەوە، تەمیس کردن؛ ۲) هێنـانی کەسێ بۆشوێنێ کە لەپێشدا نەدەهات: (من **پام کردەوە** ئەنیا نەئەهات) ف ۱) تمیز کردن؛ ۲) پاگُشائی، کسی را بەجائی که قبلا نمی‌رفت بردن.

**پاکرنەوە:** پاکردنەوە ف نگا: پاکردنەوە.

**پاکژ:** ۱) خاوێن، تەمیز، پاقژ؛ ۲) پاوان، کۆدە، جێ لەوەڕی قەدەغە ف ۱) پاکیزە؛ ۲) قُرُق.

**پاك کردن:** ۱) تۆکڵ لێکردنەوە؛ ۲) خاوێن کردنەوەی دانەوێڵە: (گەنمەکە **پاك بکـــە** بۆ باراش)؛ ۳) بژاری کێڵگـــە لە دڕکو داڵ ف ۱) پوستەچیدن؛ ۲) بوجاری؛ ۳) وجین غلّه.

**پاك کردنەوە:** خاوێن کردنەوە، تەمیس کردن ف تمیز کردن پلید.

**پاکڵ:** ۱) ئاگر هەڵکەر؛ ۲) کڵی پرد، پایەی پرد ف ۱) افروزندهٔ کوره؛ ۲) پایهٔ پُل.

**پاکڵە:** پاکڵ ف نگا: پاکڵ.

**پاك لەپاك:** تۆڵەکردنەوە: (قەرزەکە **پاك لەپاك** بو) ف بی‌حساب.

**پاکلیر:** ۱) پاقلیر؛ ۲) توێخڵی سەوزی گوێز ف ۱) نگا: پاقلیر؛ ۲) پوستهٔ سبز گردو.

**پاکـۆ:** ۱) باوەشـەگیای نەبـەستراو؛ ۲) دەسکەنەی گیا، هێندەی لەبن کەوش بنرێ؛ ۳) گیای درواوی بەسەر یەکداکراوی نەبەستراو ف ۱) دسته گیاه بسته نشُده؛ ۲) مقدار گیاه بەاندازهٔ گنجایش زیر بغل؛ ۳) مجموعهٔ گیاه دروشدهٔ بسته نشده.

**پاك و پوك:** بەفیڕۆو خۆڕایی لەدەستدان: (دەسمایەکەی **پاك و پوك** کرد) ف بهَدَر و بیهوده.

**پاکوپیس:** چاکوخراپ، رندوکرێت ف نیك و بد.

**پاکو پیسکردن:** چاك لەخراپ هەڵاواردن ف خوب از بد جدا کردن.

**پاکوەت:** شێلانو کوتان بەپێ ف لگدمال.

**پاکۆترە:** پێچوێلەکە، پێ مریشکە، گیایەکەدەخورێ ف گیاهی خوردنی.

**پاکوتە:** دەرجا، لەجێ خۆوە پێ هەڵێنانو بەزەویدا دان ف دَرجا.

**پاکۆدان:** رنینەوەی گیا بەدەست ف چیدن گیاه با دست.

**پاکۆرە:** کلۆی پێرۆ، کولۆتاباڵی نەگرتوە ف ملخچه کەهنو زپر وازنکردە.

**پاکورە:** نۆکەری بەردەستان ف نوکر.

**پاکە:** خاوێنی، تەمیزی ف تمیزی.

**پاکەپاکە:** پەتاتە، سێفەزەمینە،سێف زەمینی، کارتۆفڵ ف سیب‌زمینی.

**پاکەت:** دەفری کاغەزین بۆ نامەو هەرچی ف پاکت.

**پاکەمی:** ماندوەتی، شەکەتی، ماندگی ف خستگی.

**پاکەنە:** کەوشکەن، جێگەی کەوش داکەندن ف کفش‌کَن.

**پاکەوان:** کەنناس، سپور، کۆڵانماڵ، زبیل‌رێژ ف آشغالی، رُفتگر.

**پاکەوەبون:** ۱) خاوێن بونەوە، پاكبونەوە؛ ۲) بریەتی لە مەرگی بێ فەڕ ف ۱) تمیزشُدن؛ ۲) کنایه از مرگ بدسگال.

**پاکی:** خاوێنی، تەمیزی، پاکە ف پاکی، تمیزی.

**پاکیزە:** پاك، خاوێن، تەمیس ف پاکیزە.

**پاکێش:** یەکسم ف ستور.

**پاگا:** بواری چەم ف گُدار.

**پاگرتن:** پێ گرتن، فێرەرۆیشتن بۆنی منداڵ ف پاگرفتن بچّه.

**پاگرە:** نەخۆشی قاچ‌وقول ئەستور بون، واریس ف بیماری واریس.

**پاگۆ:** پەرسف، وەرآم، جواو ف جواب، پاسُخ.

**پاگوشا:** بردنی دەزگیرانی کچ بۆماڵی خەزور ف نامزد دختر را به خانهٔ پدری بُردن.

**پاگە:** ۱) داری ژێر رێسمەی دەرگا؛ ۲) تەوێڵە، ئاغەڵەمەڕ ف ۱) چوب زیر پاشنهٔ در؛ ۲) آغُل، طویله.

**پاگەزدان:** پێ چەقاندن، سوربون لەسەر کارێ ف لِجاج و اصرار.

**پاگیر:** پڕلە گیروگرفت ف دست و پاگیر.

**پاگیرە:** ۱) دودەپی ژێر پـای جوڵا؛ ۲) کیژی دەزگیران دار ف ۱) تختهٔ زیر پای جولا؛ ۲) دختر نامزدشُده.

**پاڵ:** ۱) پشت: (**پـاڵ** بەدیوارەوە دە)؛ ۲) جێگـەی پشت پێوەدان: (**پاڵ** پشتی لێ دانـدرابـو)؛ ۳) ئەنـدەرون: (**لـەپـاڵ** خۆیدا تورەیە)؛ ۴)

تەنشت: (لەپاڵ یەکدان)؛ ٥) هاوکاری: (دوکەس بون ئەویش هاتەپاڵیان)؛ ٦) بنارو قەدی کێو: (هەڤالێن مە دانەپاڵی)؛ ٧) ملەی کێو: (لەو پاڵە سەری دەرێنا)؛ ٨) توروزمان بەگرێ: (لاڵو پاڵ بوم لەترسان)؛ ٩) رەتاندن بەهێز، دەفعاندن: (پاڵی پێوەنێ، بەبێ پاڵ نابزوێ)؛ ١٠) زبل: (پەین وپاڵ) ف ١) پُشت؛ ٢) مُتکا؛ ٣) درون؛ ٤) جانب؛ ٥) همکاری؛ ٦) دامنەو کمر کوه؛ ٧) ستیغ کوه؛ ٨) اَلکن؛ ٩) هول دادن؛ ١٠) زُباله.

**پاڵا:** پێڵاو، پێتاو، کاڵەو کەوش و کەلاش و... ف پای افزار.

**پاڵاخ:** ١) بێچوە گامێش؛ ٢) پڕوپوشی وشك ف ١) بچهٔ گاومیش؛ ٢) خشك گیاه.

**پاڵادڕانە:** مزی ماندوبونی پا، کاڵەدڕانە ف حق القدم، پای مُزد.

**پاڵاس:** ئەسپابی ناوماڵ ف اثاثیه.

**پاڵاغ:** پاڵاخ، بێچوە گامێش ف بچهٔ گاومیش.

**پاڵافتن:** بەپاڵوێنە داکردن، ساف کردنی تراو ف پالاییدن.

**پاڵافتە:** پاڵێوراو، تراوی لە خڵتەو تڵتە پاقژ کراو، بەپاڵوێنە داکراو ف پالاییده.

**پاڵاڵ:** گوڵێکە کوێستانی ف گُلی است در کوهساران روید.

**پاڵامز:** نرخی کاڵەدڕان، هەرماڵێك شتێك ئەدەن بەشوان بۆ قەرەبوی پاڵا . پاڵادڕانە ف حق لقدم، پایمُزد.

**پالان:** کۆپان، کورتان ف پالان.

**پاڵان:** پالان ف پالان.

**پاڵانتە:** لەتە خشت، پارچە بەرد ف پارە آجُر و سنگ.

**پاڵانچە:** ١) مایچەی تەنیشت مۆرەغەی پشت؛ ٢) قەڵو بەردێ کەلێواری جۆگەی پێ دادەبەستن؛ ٣) تیسکە خوری هەڵنەپاچراو بەپشتی بەرانەوە بۆجوانی ف ١) ماهیچهٔ میان فقرات؛ ٢) سنگ و آهك کنار جوی؛ ٣) پشمی که برای زینت بر پشت قوچ می‌گذارند.

**پاڵانە:** تیسکە خوری پشتی بەران، پاڵانچە ف پشمی که برای زینت بر پشت قوچ می‌گذارند.

**پاڵانی:** ١) بارەبەر، کەرێ وەختی بارکردنی هاتبێ؛ ٢) ئەسپی باری، بارگیر، بارگین ف ١) کُرّه‌ای که وقت بارکردنش رسیده باشد؛ ٢) یابو.

**پاڵاو:** پاڵافتە ف پالاییده.

**پاڵاوتن:** پاڵافتن ف پالودن.

**پاڵاوتە:** پاڵافتە ف پالاییده.

**پاڵاوەش:** پاکەنە، کەوش کەن ف کفش کن.

**پاڵ پشت:** ١) ئەوی پشتی پێوەدەن بۆ سانەوە؛ ٢) پشتەمێر، داژدار ف ١) متکا؛ ٢) پارتی.

**پاڵ پێوەدان:** پشت پێوەدان ف تکیه‌دادن.

**پاڵ پێوەنان:** بەهێز جوڵاندن، دەفعاندن ف هول دادن.

**پاڵتاو:** ١) پاڵتۆ، پاڵتو، پاڵتە، باڵاپۆشی لەقوماشی ئەستور؛ ٢) پاڵو، کەژوی بن کلکی بارەبەر ف ١) پالتو؛ ٢) پالدُم.

**پاڵتو:** پاڵتاو، باڵاپۆشی ئەستور ف پالتو.

**پاڵتە:** پاڵتۆ، پاڵتاو ف پالتو.

**پاڵتەك:** نەخۆشی گەروی ئاژاڵ ف گلودرد دام.

**پاڵ خستن:** فڕێدانە سەر تەنیشت، خستنە سەرلا ف بر پهلو انداختن.

**پاڵدان:** ١) پشت بە شتێکەوە دان؛ ٢) بەهێز وەجوڵە خستنی شتێ: (نابزوێ، وەرە دەگەڵمان پاڵدە) ف ١) تکیه‌دادن؛ ٢) هول دادن.

**پاڵدانەوە:** ١) ئیسراحەت کردن؛ ٢) پشت بە پاڵیشتەوە دان ف ١) استراحت کردن؛ ٢) تکیه دادن.

**پاڵدامێن:** ١) لای خواروی داوێن، تەشکی داوێن؛ ٢) بناری کێو ف ١) دنبالهٔ دامن؛ ٢) دامنهٔ کوه.

**پاڵداوێن:** پاڵدامێن ف نگا: پاڵدامێن.

**پاڵداینە:** ١) پاڵدامێن، تەشکی داوێن؛ ٢) بناری چیا ف ١) دامان؛ ٢) دامنهٔ کوه.

**پاڵدم:** پشتەوەی داوێن ف پُشت دامن.

**پاڵدو:** پاڵو، کەژوی بن کلکی بارەبەر ف رانکی.

**پاڵدێم:** پاڵدم، پشتەوەی داوێن ف پُشت دامن.

**پاڵشا:** پاتشا ف پادشاه.

**پاڵشت:** جێگەی پاڵ پێوەدان ف تکیه‌گاه.

**پاڵفتە:** ١) پاڵافتە؛ ٢) دابێژراو ف ١) پالاییده؛ ٢) بیخته.

**پاڵکەفتن:** ١) لەسەرلا درێژ بون، رازان؛ ٢) پاڵدانەوە ف ١) درازکشیدن؛ ٢) تکیه دادن.

**پاڵکی:** کەژاوەی سەر ئاواڵە ف کجاوهٔ سرگشاده.

**پاڵ لێ دانەوە:** بریتی لەئیسراحەت کردنی باش ف کنایه از آسودن.

**پاڵم:** پاڵوی کورتانی بارەبەر ف رانکی.

**پاڵمە:** جۆرێکە لە ئەسپنگی گەڵاپان ف نوعی شنگ برگ پهن.

**پالمە:** پاڵمە ف نگا: پالمه.

**پاڵنان:** ١) پاڵدان؛ ٢) پاڵ خستن ف ١) هول دادن؛ ٢) بر پهلو انداختن.

**پاڵنگ:** پڵنگ، دڕندەی بەناوبانگ ف پَلَنگ.

**پاڵو:** ١) کەژو یان گوریسی بن کلك گری بارەبەر؛ ٢) تەنشت: (دارەکە چوار پاڵوکە)؛ ٣) کۆپان، کورتان؛ ٤) پاڵافتن ف ١) رانکی؛ ٢) پهلو؛ ٣) پالان؛ ٤) پالودن.

**پاڵۆ:** ١) تەمەڵو بێکارە؛ ٢) مەڵبەندو شارێکە زازای لێ دەژین ف ١) تنبل؛ ٢) منطقه‌ای در کردستان.

**پالو:** بالوك، بالوکە، باڵوکە ف زگیل.

**پاڵوانە:** ١) پاڵوێنە، راوك؛ ٢) پەڕەسێلکەی گوێ سوانان رەشی باڵدرێژی قاچ کورتە ف ١) پالونه؛ ٢) چلچله.

**پاڵوبەن:** پشتیوان، داژدار ف طرفدار، هواخواه.

**پاڵۆدان:** پاڵدانەوە ف تکیه‌دادن، لَم دادن.

**پالودە:** خواردنێکە لەکرمی سپی دەکا، نیشاستەی پاڵێوراوە دە شەکری دەکەن ف پالوده، فالوده.

**پاڵوگیر:** ١) دەپێکە بۆ راستەو پاستەی دۆلاش بەکاردێ؛ ٢) برینی بن کلك لەزبری پاڵورا ف ١) وسیله اندازه‌گیری در آسیا؛ ٢) زخم حیوان از زبری رانکی.

**پاڵوێنکە:** راوك، ئەوپارچە بوزوەی شیری پێ دەپاڵێون ف پالونە.

**پاڵوێنە:** پاڵوێنکە ف پالونە.

**پاڵـە:** ١) شاری گەورە؛ ٢) دەربـارو دیوەخـانـی گەورەپیاوان؛ ٣) درویـنـەوان؛ ٤) کرێکـار، فەعلە، عەمـەڵـە؛ ٥) سەپـان، رەنجبـەری پێنج یەك بەری داهات، یان سێ یەکبەر؛ ٦) پەڵە دەغڵی نەدرواو ف ١) شهـر بزرگ؛ ٢) دربـار بزرگان؛ ٣) دروگر؛ ٤) کارگر؛ ٥) رنجبـر سهمیەگیر؛ ٦) قطعەای از غلّهٔ درونشده.

**پاڵـەپـەست:** ١) بەزۆر ئاخنین، بەهێز تێ پەستـاوتن؛ ٢) بەزۆر خۆ دەربازکردن لەناو حەشامات ف ١) با فشار آگندن؛ ٢) بزور خود را از شلوغی رهانیدن.

**پاڵەپەستۆ:** پاڵەپەست ف نگا: پاڵەپەست.

**پاڵـەقە:** ١) جوتە، لوشك؛ ٢) لاقەفرتە، پەلەقاژە ف ١) لگدپرانی؛ ٢) دست و پا زدن.

**پاڵەنگ:** رەشمە، ریشمە، هەوساروکە ف افسار و مَهار.

**پاڵەوان:** ١) پیاوی زۆر ئازا، قارەمان؛ ٢) دارێ کە دەخرێتە بن کاریتەوە ف ١) قهرمان؛ ٢) چوب زیر دیرك.

**پاڵەوان بازی:** زۆرانی، زۆرانبازی، زۆرەوانی، زۆرەبانی، عەفرە ف زورآزمایی.

**پاڵەوانە:** ١) بەرێکی دارمازو؛ ٢) پشتیوانەی دیواری شکست؛ ٣) داری بن دیرەگ ف ١) نوعی ثمر مازوج؛ ٢) پشتیبانهٔ دیوار ضعیف؛ ٣) شمعك.

**پاڵەوی:** گوڵە بەرۆژە ف گُل آفتاب گردان.

**پاڵەهەنگ:** کۆتو زنجیری پای زیندانی ف کندو زنجیر پای زندانی.

**پاڵێ:** ١) بێڵی دارین؛ ٢) پالاَ، پێڵاو؛ ٣) پالوی بارەبەر ف ١) پارو؛ ٢) پای‌افزار؛ ٣) رانکی.

**پالیك:** بەرسمێڵ، موی سمێڵ کە دەکەوێتە سەر ردێن ف موی سبیل کە بر ریش آید.

**پالیموك:** گیایەکە بنەکەی دەخوری ف گیاهی است کە بیخش خوردنی است.

**پاڵێن:** ١) ئامرازی پالاَوتن، کەوگیرو پاڵوێنە؛ ٢) سەرلە ئێوارە ف ١) پالونە؛ ٢) دَم عصر.

**پاڵینان:** ئێواران کاتی مەڕ دۆشین ف هنگام عصر زمان دوشیدن گوسفندان.

**پاڵێو:** پاشگر بەواتا ئەوشتەی دەپاڵێوی: (چاپاڵێو، برنج **پاڵێو**) ف پسوند بەمعنی پالندە.

**پاڵێوران:** پالاَفتن ف پالودە شدن.

**پاڵێوراو:** ١) پالاَفتە؛ ٢) ناودێرکراو بۆکارێ ف ١) پالودە شدە؛ ٢) نامزد شدە برای کاری.

**پاڵێوکە:** پاڵوێنە ف پالونە.

**پاماسێ:** پاگرە، نەخۆشی قاچ ئەستوربون ف بیماری پاغر.

**پامال:** لەبەین چو، تەرتو تونا ف پایمال، تارومار.

**پاماڵە:** خێشك، ئامرازێ زەوی شوکراوی پێ رێك دەکەن ف مالهٔ کشاورزی.

**پاماو:** لوس کردنی سواغی گێچ بەپەڕوی تەڕ ف صاف کردن دیوار گچی با کهنهٔ خیس.

**پامز:** مزیهاتن ف پایمزد.

**پامورە:** ١) لیزگەموروی خشڵی قولەپێ؛ ٢) خرخاڵی پا، پاوانە ف ١) رشتهٔ زینتی مچ پا؛ ٢) خلخال مُچ پا.

**پامەڕە:** پێ‌مەڕە ف بیل آهنی.

**پامێزە:** ١) گوی مێشە نگوین کە دوای ئاو خواردن دەیکاو دەبێتە هۆی دۆزینەوەی شەڵخەمێشەکە؛ ٢) کوڵکەی پەلی ئاژەڵ؛ ٣) شاوەتی تەگە کە بەلاڕانیەوە وشك دەبێتەوە ف ١) مدفوع زنبور عسل کە نشانەای در یافتن جهت لانەاش است؛ ٢) کُرك پای دام؛ ٣) آب پُشت تکە بر بدنش.

**پان:** هەراو، بەرانبەری تەسك، پەهن، بەرین ف پهن.

**پاناو:** سەرچیای تەخت، تەختایی سەری کەژ ف جای هموار بر قُلّە کوە.

**پاناوکە:** گۆمیلکەی ئاو لە دەشتا ف برکەای در میان جُلگە.

**پانایی:** بەرینی، هەراوی ف پهنا.

**پان‌بونـەوە:** ١) دەبـەربێدا تلیخـانەوە؛ ٢) لەتەسکیەوە بەرین بون؛ ٣) برێتی لە راکشان: (هەتیو چیتە؟ **پان بویەوە!**) ف ١) زیر پا لە شدن؛ ٢) پهن شدن؛ ٣) کنایە از لم دادن.

**پان بەپان:** بەبێ رودەروایسی بەئاشکرا قسەکردن ف رُك و پوست کندە سُخن گفتن.

**پانپانۆکە:** خۆ بەیەکتر رەحەت کردنی ژنان ف همجنس بازی زنان.

**پانپانۆکێ:** پانپانۆکە ف نگا: پانپانۆکە.

**پانتاو:** ١) پاناو، گۆڕایی سەرچیا؛ ٢) دەشتی پان و راست و بێ زۆرك ف ١) همواری در قلّهٔ کوە؛ ٢) جلگهٔ هموار.

**پانتۆڵ:** پاتۆڵ ف شلوار.

**پانتە:** کرنوش، داهاتنەوە بۆریزلێ نانی کەسێ ف تعظیم.

**پانجـار:** بنـەگیا، *گیای خواردنی مرۆ، وەك شنـگ و پنـگ و گیای* سورەوەکردن ف بیخ گیاهان خوردنی.

**پانجەقولێ:** پا لەپا پێچان لە زورەبانیدا ف لُنگ کردن در کُشتی.

**پاندان:** قەڵەمی خۆنوس، ئەو قەڵەمەی مەرەکەفی دەپاڵ خۆی دەکرێ ف قلم خودنویس.

**پانزە:** پازدە، دەوپێنج ف پانزدە.

**پانزەمین:** ژمارەی نۆبەتی بۆ پانزە ف پانزدهم.

**پانزەهەم:** پانزەمین ف پانزدهم.

**پانزەهەمین:** پانزەمین ف پانزدهم.

**پانزەیەم:** پانزەمین ف پانزدهم.

**پانکـردنـەوە:** ١) پێ رێ خستن؛ ٢) لەتـەسکـەوە بەرین کردن؛ ٣) راخستنی سفـرەو بەڕەو... ف ١) پامال کردن؛ ٢) عریض کردن؛ ٣) انداختن سفرە یا گلیم و...

**پانکـە:** ١) جۆرێ بەری دارمـازو؛ ٢) قولـەی پان؛ ٣) جۆرێ ماسی گرۆڤـەر؛ ٤) باوەشێنی کارەبـایی، باوەشێنی بەرقی ف ١) نوعی ثمر

مازوج؛ ۲) کوتاهِ عریض؛ ۳) نوعی ماهی؛ ۴) بادبزن برقی.

**پانکەڵە:** پانی خڕوچکۆڵە [ف] پهنِ گرد و کوچك.

**پانۆبون:** هەراو بونەوە، بەرین‌بو ن [ف] عریض شدن.

**پان‌وپۆڕ:** بەرین‌و هەراو، زۆرگوشاد [ف] بسیار عریض.

**پان‌وفلچ:** بەرپێ دڕاوی هەڵشێلدراوی لەکارکەوتە [ف] لەشدە.

**پانەگا:** جێگەی روانی توکەبەر [ف] عانە، زهار.

**پانەوپان:** ۱) بەلای پانایی‌دا؛ ۲) بەئاشکراو بێ مەرایی: (**پانەوپان** پێم گوت) [ف] ۱) از پهنا؛ ۲) رُك و صریح.

**پانەوەبون:** ۱) پلیخانەوە؛ ۲) پانۆبو ن [ف] ۱) لەشُدن؛ ۲) عریض شدن.

**پانی:** ۱) بەرینی، پەهنی؛ ۲) پاژنە، پانیە [ف] ۱) پهنا؛ ۲) پاشنە.

**پانی‌بەرز:** جۆرێ کەوشی پاژنە بڵند [ف] نوعی کفش پاشنە بُلند.

**پانێر:** پارێن، گوێلکی پار، گوێل‌پار [ف] گوسالۀ پارینە.

**پانیە:** پاژنە، پانی [ف] پاشنە.

**پاوان:** قەدەغە، قۆرغ. مێرگ یا باغی تایبەتی کەسێك نەتوانێ سەربەخۆ بچێ‌تێ: (لـە باغچـەی ساوای **پاوانی** سینـە / پەنجـەم سەرگەرمی لیمۆگوشینە) «هەژار» [ف] قُرغ، مکان انحصاری.

**پاوانە:** پامورە [ف] نگا: پامورە.

**پاوپـا:** ۱) دودڵـــی، گومـان؛ ۲) خۆ وەدوا خستـــن [ف] ۱) گمـان؛ ۲) تأخیر کردن.

**پاوپل:** ۱) قاچ‌وقول، لەئەژنۆ بەرەژێر؛ ۲) برێتی لە توانایی‌و کارایی [ف] ۱) از پای تا زانو؛ ۲) کنایە از تاب و توان.

**پاور:** منالْدان [ف] زهدان.

**پاوڕوا:** پاپەتی، پێخواس، خواس [ف] پابرهنە.

**پاوشا:** پاتشا [ف] پادشاه.

**پاوشك:** بەدقەدەم، پێ‌ڕەش [ف] بدقدم.

**پاوموری:** هەوایەکی گۆرانیە، قامێکە، مقامێکە [ف] آهنگی است.

**پاون:** پاوان [ف] نگا: پاوان.

**پاونە:** پێوەند، کۆت‌و زنجیر [ف] کندپای زندانی.

**پاوە:** ۱) پاوان؛ ۲) ناوی شارێکـە لە کوردستـان [ف] ۱) نگا: پاوان؛ ۲) شهری در کردستان.

**پاوەپا:** ۱) هاوڕایی؛ ۲) دودڵی؛ ۳) خۆوەدوادان‌و سستی [ف] ۱) همراهی؛ ۲) تردید؛ ۳) اِهمال.

**پاوەجێ:** جێ‌قایم، لە لەقین بەدور [ف] ثابت.

**پاوەجێگە:** پاوەجێ [ف] ثابت.

**پاوەرە:** ۱) دەرپێ؛ ۲) پێڵاو، پاپۆش [ف] ۱) زیرشلواری؛ ۲) پای‌افزار.

**پاوەمانگ:** زكپڕ لەو مانگەدا کەتیا ئەزێ [ف] پابماه.

**پاوەن:** ۱) پاوان؛ ۲) پیوەند؛ ۳) دراوێکی ئینگلیس؛ ۴) پامورە [ف] ۱) نگا: پاوان؛ ۲) بندپای؛ ۳) واحد پول انگلیس؛ ۴) نگا: پامورە.

**پاوەند:** ۱) پاوان؛ ۲) پێوەند [ف] ۱) نگا: پاوان؛ ۲) بندپا.

**پاوەنە:** پامورە [ف] نگا: پامورە.

**پاوەوی:** پێخەسو، بەربوك [ف] ینگە.

**پاوەی:** بەربوك [ف] ینگە.

**پاوەیو:** پاوەوی [ف] ینگە.

**پاوێنە:** پامورە [ف] نگا: پامورە.

**پاهەڵکەفتن:** هەڵەنگوتن، ڕەت بردن [ف] سکندری خوردن.

**پاهەڵگرتن:** بەلەز چون، خۆشتر ڕۆیشتن [ف] بسرعت رفتن.

**پاهەڵگیر:** بارەبەر [ف] باربر.

**پای:** ۱) پەردە؛ ۲) بەش، دابـەش؛ ۳) عۆدە، لەمـل [ف] ۱) پردە؛ ۲) قسمت؛ ۳) عُهدە.

**پایا:** بەردەوام، قایم، خۆڕاگر [ف] ثابت.

**پایان:** ئاخر، دوماهی، دوایی [ف] پایان.

**پایتەخت:** پاتەخت، شاری شانشین [ف] پایتخت.

**پایدۆس:** دەست لەکار هەڵگرتن [ف] دست از کار کشیدن.

**پایدۆست:** پایدۆس [ف] نگا: پایدۆس.

**پایز:** سێهەم کژی سال [ف] فصل پاییز.

**پایزە:** ۱) چانـدنی پایزی، بەرانبەری بەهارە؛ ۲) جۆرێ ترێ دەنك زل لەپایزا دەگا [ف] ۱) کشت پاییزە؛ ۲) نوعی انگور.

**پایزەبرا:** بریەتی لەدۆستێ کە درەنگ دەیبینی [ف] کنایە از دوستی کە کم پیدا شود.

**پایزەرێز:** شەختە لێدراو، سەرمابردوی پایز [ف] سرمازدۀ پاییزی.

**پایزی:** ۱) چانـــدنی پایزە؛ ۲) جۆرێ هەنجیر [ف] ۱) کشت پاییزە؛ ۲) نوعی انجیر.

**پایژی:** لێکدانەوەی خەو [ف] تعبیر خواب.

**پایسکل:** ئەسپەدارینە، دوچەرخە [ف] دوچرخە.

**پایکردن:** دابەش کردن [ف] توزیع کردن.

**پاین:** ۱) لای خوارو؛ ۲) جێگەی پێ لەگۆڕدا؛ ۳) چاودێری، ئاگالێ بو ن [ف] ۱) پایین؛ ۲) جای پا در قبر؛ ۳) نظارت و مراقبت.

**پایناز:** بەخێرهێنانی گەرم‌و گوڕ، خۆش‌وبێش بەمێوان گوتن [ف] استقبال گرم از مهمان.

**پاینـاو:** ۱) قونـاو، ئاوێ لەئـاوداشتنـا لە زەوی دەردەچێ؛ ۲) سەوزەی تێراوی لەشۆق [ف] ۱) پساب آبیاری؛ ۲) شاداب.

**پایندە:** خۆڕاگر، جێ‌قایم [ف] پایندە.

**پاینە:** پایندە [ف] پایندە.

**پایوان:** پەردەداری پیاوی گەورە [ف] پردەدار.

**پایە:** ۱) هیم، بناغە؛ ۲) پلەو دەرەجە؛ ۳) کۆڵەکەی لەخشت‌و سمنت؛ ۴) سەروپێ، پاچە [ف] ۱) پایە؛ ۲) درجە و رتبە؛ ۳) ستون سیمانی؛ ۴) کلّەپاچە.

**پایەبەرز:** پیاوی گەورە [ف] بلندپایە.

**پایەدار:** خۆڕاگرو جێ‌قایم [ف] پایدار.

**پایەداری:** هەرمان‌و خۆڕاگری [ف] پایداری.

**پایەروقی:** هەوای ئاڵۆزو بەتەم‌و دومان [ف] هوای مُنقلب.

**پایەماڵ:** پاماڵ [ف] پایمال.

**پایەناز:** ژێر راخەر، ژێر پێ راخەر [ف] پای‌انداز.

**پایەنداز:** پایەناز [ف] پای‌انداز.

**پایین:** ۱) لای ژێرو؛ ۲) چاودێری کردن، بەچــاو ئاگالــێ بون ف ۱) پایین؛ ۲) پائیدن.

**پپڵە:** پلپلە، زێڕەسکەی ورد لەزنجیردا بۆخشڵ ف زیورآویزە.

پت: ۱) لێدانی رەگ، نەبــز؛ ۲) خودای دەستکرد، بت؛ ۳) کەپۆ، لوت، بێڤل، دفن؛ ۴) نوختە، خاڵ؛ ۵) خونجەی گیا؛ ۶) پتە، پڵتۆك، بەنینۆك لەشتێك دان؛ ۷) ئەوەندەی لەناو سەرپەنجەی قامکی گەورەو شادەدا جێگـەی دەبێتـەوە: (**پتێ** دەرمـان، **پتێك**چای)؛ ۸) سرکـە، سرتـە، پچـەپــچ؛ ۹) نوك، سەری باریکی شت؛ ۱۰) بۆڵە، ورتە؛ ۱۱) شلو سست ف ۱) نبض؛ ۲) بُت؛ ۳) بینی؛ ۴) نُقـطه؛ ۵) غُنچهٔ گیاه؛ ۶) تلنگُـر؛ ۷) بار دو انگشت؛ ۸) پِچ پِچ؛ ۹) نوك هرچیز؛ ۱۰) غرولند؛ ۱۱) شُل و سست.

**پتاپت:** سرکە، سرتە، سرتو خورت ف حرفِ بیخ گوش.

**پتات:** زۆرویژ، چەنەوەر، هەڵەوەڕ، چەقەسرۆ، زۆربڵێ، چەنەباز ف وراّج.

**پتپا:** نوکی پەنجەی پا ف نوك پا.

**پتپت:** بۆڵەو پرتە ف غرولند.

**پتپتك:** شێوی ساواری ورد، پیرخەنیلە ف آش بلغور.

**پتپتۆك:** جۆرێ پەپولەی خاڵدار ف نوعی پروانه.

**پتپتۆکە:** گوڵێکی سوری سەرە بەهارە ف از گلهای قرمز بهاری.

**پتخی:** رەنگ پەڕیو، بێ‌ڕەنگ، رەنگ بزرکاو ف رنگ‌پریده.

**پتر:** ۱) زوُتر: (**پتر**بێرێ)؛ ۲) زۆرتر: (**پتر**یان نان داپێمان) ف ۱) زودتر؛ ۲) بیشتر.

**پترۆ:** قرتماخەی سەربرین ف کبرهٔ زخم.

**پترۆخە:** پترۆ ف کبرهٔ زخم، خَشك ریشه.

**پترۆك:** پارچەی زۆر بچوك لە هەویرو نان ف جُزءِ کوچکی از خمیر و نان.

**پترۆکە:** ۱) پترۆ؛ ۲) پترۆك ف ۱) نگا: پترۆ؛ ۲) نگا: پترۆك.

**پتوپوُز:** لچ‌و لێو، دەم‌وپوز ف نس، پوز.

**پتە:** پتکە، بەیەك قامك لێدان، پت ف تلنگُر.

**پتەپت:** ۱) لەرزین‌و پت دانی گڕی چرا؛ ۲) بۆڵەوپرتە ف ۱) سوسوی چراغ؛ ۲) غرولند.

**پتەو:** ناوپڕ، بەهێز، قایم ف توپُر و مُحکم.

**پتەی:** پێتن ف پختن.

**پتێتە:** پەتاتە، سێفە عەرزیلە ف سیب‌زمینی.

**پتیك:** گەنە ف کنه.

**پتیلە:** پڵیتە، فتیلە ف فتیله.

**پچ:** ۱) پێچ، بادراو، بادان؛ ۲) کەموکە؛ ۳) سرتە، سرکە ف ۱) پیچیده، پیچ؛ ۲) اندك؛ ۳) حرف بیخ گوش.

**پچانن:** سرتەکردن ف در گوشی حرف زدن.

**پچڕان:** لەبەریەك چون، پسان، قرتیان، قەتیان ف گسیختن.

**پچڕاندن:** قرتاندن، پساندن ف گُسلانیدن.

**پچڕاندنەوە:** ۱) دوبارە پساندن؛ ۲) دڕاندنی بەرگی دژ لە شەڕدا ف ۱) باز گُسلاندن؛ ۲) پارە کردن لباس کسی.

**پچڕانن:** پچڕاندن ف گُسلاندن.

**پچـڕانەوە:** دوبارەپسان: (بەندی گەردن بەندەکەم دوبارە **پچڕایەوە**) ف دوبار گسستن.

**پچڕاو:** پساو، قەتای، قرتیاگ ف پارەشده.

**پچـڕپچـڕ:** ۱) پس‌پس، هەودای لەچـەنـد جێوە پساو؛ ۲) بەش‌بەشی کەم‌کەم: (نـــانمـــان **پچـڕپچـڕ** دەداتێ)؛ ۳) دژواری؛ ۴) راوانــدن‌و بێ‌سەروبەر گوتن: (قسەکانی **پچڕپچڕ** دەکرد کەس نەیدەزانی دەڵێ چی) ف ۱) گسسته و پارەپارە؛ ۲) اندك اندك؛ ۳) دشواری؛ ۴) درهم و برهم گفتن.

**پچرك:** جۆرێ کولێرە ف نوعی گردهٔ نان.

**پچڕۆك:** ئامادەی پسان، لەپسان نزیك ف نزدیك به گسستن.

**پچڕیاگ:** پچڕاو ف گُسسته.

**پچڕیان:** پچڕان ف گسستن.

**پچڕین:** ۱) پساندن؛ ۲) بردن، دەست کەوتن: (بەشی خۆی **پچڕی**) ف ۱) گسلیدن؛ ۲) بُردن.

**پچڕێن:** کەسێ دەپچڕێنێ ف گُسلنده.

**پچڕینەوە:** دورکەوتن: (کاکم لەئێمە **پچڕیوەتەوە** هاتوچومان ناکا)؛ ۲) لەشەڕدا بەرگی یەکتر بەچنگ دڕاندن ف ۱) قطع علاقه و ارتباط؛ ۲) از فرط خشم لباس هم را پاره کردن.

**پچکۆڵ:** چکۆڵە ف کوچولو.

**پچکۆڵانە:** پچکۆڵ ف کوچولو.

**پچکەلانە:** پچکۆڵ ف کوچولو.

**پچکەڵە:** پچکۆڵ ف کوچولو.

**پچمە:** تەویلە، تەوێڵە ف اصطبل.

**پچوك:** ۱) چکۆڵە؛ ۲) بریەتی لە خزمەتکار و ژێردەست ف ۱) کوچولو؛ ۲) کنایه از نوکر.

**پچوك‌بون:** ژێردەستی کردن ف خدمتکار بودن.

**پچوك بونەوە:** دوای زلی کەم کردن ف کوچك شدن.

**پچوك کردنەوە:** لە زلی کەم کردنی شتێ یا کەسێ ف کوچك کردن.

**پچوکی:** ۱) چکۆڵەیی؛ ۲) خزمتکاری، نۆکەری ف ۱) کوچکی؛ ۲) نوکری.

**پچە:** ۱) سرتە، سرکە؛ ۲) تەویلە ف ۱) درگوشی؛ ۲) اصطبل.

**پچەپچ:** پچە ف درگوشی.

**پچیان:** پێچ خواردن ف پیچش.

**پچین:** شەق تێهەڵدان ف تیپا.

**پخ:** ۱) وشــەیەکــە بۆ دەخــەوکــردنی مناڵ دەگوترێ؛ ۲) بۆ ترساندنی بەگاڵتــە؛ ۳) سەربــڕین بەزمــانی منــداڵان ف ۱) لالایی کودك؛ ۲) بشوخی ترساندن؛ ۳) بەزبان بچّە سربُریدن.

**پخك:** پخ، وشەی ترساندنی بەگاڵتە ف بشوخی ترساندن.

**پخۆ:** بخۆ، فەرمانی خواردن ف بخور.

**پخە:** ۱) فڕێ‌یدە، باوێژە؛ ۲) بدەبەزەویدا، لەهەردی‌دە ف ۱) پرت کن؛ ۲) بر زمین بزن.

**پدو:** پوك، گوشتی بن ددانان [ف] لثه.

**پر:** پرد، ڕێبازی هەڵبەستراو لەسەر ئاو، جیسر [ف] پُل.

**پڕ:** ١) تژە، تژی؛ ٢) زۆر، زاف، گەلـەك، زیاد؛ ٣) حەشـامات، خەڵكی زیاد؛ ٤) تونـدیو سفتی تەنـراو؛ ٥) تورەو بەڕك: (دلّم لێت پڕە)؛ ٦) خەمنـاك: (دلّم پڕبـو گریام)؛ ٧) زۆرزاناو دانا: (مەلایەكی پڕە)؛ ٨) چڵەكـا، چڵەپـوش: (پـڕوپـوش)؛ ٩) بێمانـا: (پڕوپوچ)؛ ١٠) بیر: (قسەی پڕو پیرێژنانە باوەڕ مەكە) [ف] ١) پُر؛ ٢) بسیار؛ ٣) ازدحام؛ ٤) بافتهٔ سِفت و پُرپُشت؛ ٥) خشمگین؛ ٦) غمگین؛ ٧) عالم پُرمایه؛ ٨) خس؛ ٩) بی‌معنی، مُهمَل؛ ١٠) پیر.

**پراخ:** یاپراخ، دولمەی گەڵامێو، ئاپراخ [ف] دُلمهٔ برگ مو.

**پراش:** ورد، لەتی چكۆڵە [ف] ریزه.

**پراش پراش:** لەت لەت، وردوخاش [ف] ریزریز.

**پراو:** پلاو [ف] پلو.

**پڕان:** ١) دڕان؛ ٢) بڕان [ف] ١) پاره‌شدن؛ ٢) بُریده‌شدن.

**پڕاندن:** ١) دڕاندن؛ ٢) بڕین [ف] ١) پاره‌کردن؛ ٢) بُریدن.

**پڕاوپڕ:** دارماڵ، لێواولێو، لیپ [ف] مالامال.

**پرای:** پەڕین، بازی گەورە بردن، بازدان، خۆهەڵدان [ف] جَهش.

**پڕایی:** ١) ناوەراست: (لـەپـڕایی ناوەكـەدا)؛ ٢) كۆمـەڵو جەماوەری: (پڕایی خەڵكەكە هات) [ف] ١) جرگه، وسط؛ ٢) اکثریت.

**پڕبار:** داری زۆر بەمیوە [ف] درختِ پرثَمر.

**پڕبون:** بروانەپڕ [ف] پُرشدن.

**پڕبـونەوە:** هەڵكەندراوی گڵ تێكراو، والای دوبارە پێكراو: (چاڵی بەر دەركەكە پربوتەوە) [ف] پُرشدن دوباره.

**پڕبەپڕ:** لیپاولیپ [ف] لبالب، مالامال.

**پڕبەدڵ:** بەراستی، لەتەهی دڵەوە [ف] از تهِ دل.

**پڕبەر:** پڕبار [ف] درختِ پرمیوه.

**پڕبێژ:** چەنەباز، زۆربلێ [ف] وراّج.

**پڕپا:** هەزارپێ، زیڵو [ف] هزارپا.

**پرپـره:** ١) پولـەكە، بریقە، نۆییە؛ ٢) پەرەنگی گوارە؛ ٣) پەڵپینە [ف] ١) پولك؛ ٢) آویزهٔ گوشواره؛ ٣) گیاه خرفه.

**پرپریك:** ١) پەڵپینە؛ ٢) پەپولە [ف] ١) گیاه خرفه؛ ٢) پروانه.

**پرپلیك:** پەڵپینە [ف] گیاه خرفه.

**پرپـوڵ:** ١) كۆنـەپـەڕۆ، پارچـەی كۆنی دڕاو؛ ٢) سست، شل، ناقـایم، خۆنەگر [ف] ١) کهنه پارچه؛ ٢) شُل و نامحکم.

**پڕپوڵە:** ١) چێشتی گزمولە هەویرو كوزەڵە؛ ٢) دانی جوچكە مریشكی تازە لە هێلكە دەرهاتو [ف] ١) اوماج؛ ٢) زواله.

**پرپه:** پڕپا [ف] هزارپا.

**پڕپیاكـردن:** ١) لێ نەوین بۆ ڕفاندن؛ ٢) دەباوش گرتن لەناكاو [ف] ١) گرفتن بەقصد ربودن؛ ٢) ناگهان در آغوش گرفتن.

**پرپیت:** ١) زۆر بەبەرەكەت، بەرێژەو؛ ٢) پەلەقاژەو هەڵبزۆقینی مریشكی سەربڕاو [ف] ١) پُر برکت؛ ٢) دست و پازدن مرغ سربُریده.

**پڕپیش:** پڕوپوش، گیای بابردەڵەی وشك [ف] خَس و خاشاك.

**پرت:** پارچۆكە، كلۆی چوك: (پرتێك قەندم دەیە!) [ف] کلوخك.

**پڕتاف:** لینگ‌دانی ئەسپ بەچوارناڵە، پڕتاو [ف] پُرتاب، چهارنعل تاختن.

**پڕتافانن:** وەغاردان خستنی بەچوارناڵە [ف] چهارنعل تاختن.

**پرتافیان:** توندغاردان [ف] تاختن.

**پڕتافین:** پرتافیان [ف] تاختن.

**پرتافێن:** گرێوەغار [ف] مسابقهٔ اسب‌دوانی.

**پڕتاڵ:** ١) كۆتاڵ،ماڵی گەزی؛ ٢) پێخەف [ف] ١) کالای زرعی؛ ٢) رختخواب.

**پرتاڵ:** كەلوپەلی ناوماڵ [ف] اثاثیهٔ خانه.

**پڕتان:** نوێن، پێخەف [ف] رختخواب.

**پڕتاو:** پڕتاف [ف] پرتاب.

**پرتك:** پرت، بەشێكی زۆركەم لەشتێكی زۆر [ف] ریزه.

**پرتكاندن:** بەش بەشو لەت‌لەت كردن، ورد كردن [ف] ریزه‌ریزه کردن.

**پرتكه:** وردە، كەموكە: (**پرتكه** نانێك نادا بەباوكی) [ف] ریزه.

**پرتوك:** ١) پرتكە؛ ٢) رزین، رزی [ف] ١) تکه پارچه، ٢) پوسیده.

**پرتوكی:** گەللایی، بێ‌قاعیدەو قانون، بەرەڵایی [ف] بی‌بندوباری.

**پرتوكیاگ:** رزیو، رزی [ف] پوسیده.

**پرتوكیان:** رزین [ف] پوسیدن.

**پرته:** ١) پت‌دان، لێدانی رەگ، نەبز؛ ٢) تروكەی گڕی چرا؛ ٣) بوڵەی بن لێوان [ف] ١) نبض؛ ٢) سوسوی چراغ؛ ٣) لندیدن.

**پرتەپرت:** پرتەی زۆر [ف] «پرته»ی زیاد.

**پرتەقاڵ:** فلتەقان، میوەیەكی بەناوبانگە [ف] پُرتقال.

**پرتەقاڵی:** رەنگی زەردی ئاماڵ سوور [ف] زرد پرتقالی.

**پرچ:** ١) موی درێژی سەر، كەزی؛ ٢) پەڕی باڵندە؛ ٣) موی لەش [ف] ١) گیس، زُلف؛ ٢) پر پرنده؛ ٣) موی بدن.

**پرچك:** پریشكی ئاوی بەكوڵ [ف] قطرات پاشیده از آب جوش.

**پرچن:** ١) خاوەن پرچ؛ ٢) موی تێكـەڵاوی پڕی شانـە نەكراو [ف] ١) کاکُل‌دار؛ ٢) ژولیده‌مو.

**پڕچەك:** چەكداری سازو تەیار لە سیلاحدا [ف] سلحشور.

**پرچەمێك:** چەكچەكی، شەمشەمەكوێرە [ف] خُفاش.

**پرچی ئایشەو فاتمان:** كۆلكە زێڕینە، كەسكەسۆر [ف] رنگین کمان.

**پڕچین:** زۆرچین‌دار، ناصاف [ف] پرچین و شکن.

**پرخ:** دەنگی كەپۆی خەولێكەوتو، پرخە [ف] خُرناسه.

**پرخاندن:** پرخەكردن لەخەوا [ف] خُرناسه کشیدن.

**پرخانن:** پرخاندن [ف] خرناسه کشیدن.

**پرخن:** كەسێ لەخەوا بپرخنێ [ف] کسی که در خواب خروپُف کند.

**پرخوهوڕ:** پرخەی زۆرو بەهێز [ف] خُرناسهٔ زیاد.

**پرخه:** پرخ [ف] خُرناسه.

**پرخەپرخ:** پرخەی زۆر [ف] خُرناسهٔ زیاد.

**پرد:** پر، ڕێباز لەبان ئاو [ف] پُل.

**پڕدان:** پڕپێداكردن، گرتنو رفاندن [ف] گرفتن و ربودن.

**پردو:** جۆرێ كاڵەك [ف] نوعی خربزه.

**پرده:** وردە ئەسپاب: (وردەو **پرده**) [ف] خرت و پرت.

**پردەڵە:** ١) دارەڕای سەر خەرداری ئاش؛ ٢) دارێکی درێژە لە ئەسپابی جۆلاییدا ف ١) ابزاری در آسیاب؛ ٢) ابزاری در جولایی.

**پڕز:** ریشۆڵەی پارچە ف پُرز پارچە.

**پڕزانگ:** منالْدان، زێدان، زێ ف زهدان.

**پڕزگ:** زیپکەی ورد ف جوش ریز بر پوست.

**پڕزوُ:** ١) بەهێزو تابشت؛ ٢) خۆڕاگرو پشودرێژ ف ١) قدرتمند؛ ٢) شکیبا.

**پرزۆڵ:** تیتۆڵ، بزگوڕ ف تکە کهنۀ کثیف و پارە.

**پرزۆڵە:** پرزۆڵ ف نگا: پرزۆڵ.

**پرزە:** ١) قەسەڵ، بەرماوی ئالْف لە ئاخوڕدا؛ ٢) لەتە قامیشی باریك؛ ٣) فرکاندن، هەڵ پڕیواندن، ڕێك خستنی جلی قوڕاوی تا قوڕەکەی لێ هەڵـــوەرێ؛ ۴) هێزو تاقـــەت: (پـــرزەم لێ بڕاوە)؛ ۵) بەش‌و ماف: (هەموی خوارد پرزەی منی، بڕی) ف ١) پس‌ماندۀ آخور؛ ٢) پوشال باریك نی؛ ٣) گل و خاك از لباس گرفتن؛ ۴) رَمَق و توان؛ ۵) حقوق و قسمت.

**پڕژ:** بڵاو، پەرژ، پەرێشان، پڕش ف پراکندە.

**پڕژان:** ١) بڵاوبـــونی شتی ورد؛ ٢) بەزەوی وەربـــونی ئاو یان تۆو: (ئاو مەپـــڕژێنە، تۆو بپڕژێنە)؛ ٣) زۆر بەئێش‌و ئازار ف ١) پراکندگی؛ ٢) افشان شدن آب یا بذر بر زمین؛ ٣) دردناك.

**پڕژاندن:** بڵاوکردن ف افشاندن.

**پرژۆڵ:** پڕژ ف افشان.

**پڕژە:** پڕیشك ف پشنگ آب.

**پرس:** پرسیار، وتەیێ کە جوابی گەرەکە ف پرسش.

**پرسا:** پرسکەر، بەپرسیار ف پُرسش‌کنندە.

**پرسانە:** دیاری بۆماڵی تازیەبار ف هدیە بە صاحب عزا.

**پرسك:** زیپکە ف جوش صورت.

**پرسنامە:** قاقەزی پرسیاران کەئەبێ پڕ کرێتەوە ف پُرسشنامە.

**پرسە:** ١) دیدارکردن لە نەخۆش؛ ٢) تازیە، ئازیەت ف ١) عیادت بیمار؛ ٢) عزاداری.

**پرسەگورگانە:** پرس پێ کردنی ڕواڵەتی‌و بەقسە نەکردن ف پُرسش تعارفی.

**پرسەگورگانێ:** پرسەگورگانە ف پُرسش تعارفی.

**پرسیار:** پرس، پسیار ف پُرسش.

**پرسین:** پرس کردن ف سؤال کردن.

**پرسینـــەوە:** ١) بەسەرکردنەوە؛ ٢) سەرحیساب بون ف ١) رسیدگی بە زیردست؛ ٢) حساب‌رسی.

**پڕش:** پڕژ ف افشان.

**پرشنـــگ:** ١) تیرێژ، تیرۆژ، تیشکی ڕۆژ، تیشـــك؛ ٢) پڕیشکـــەی ئاگر، پزیسك ف ١) تابش؛ ٢) شرارە.

**پرشە:** ١)ورشە، گرشە، درەوشین؛ ٢)پڕژە ف ١)درخشش؛ ٢)نگا: پرژە.

**پڕقێنە:** قورقێنە، قرپ، دەنگ‌لەقورگەوەلەتێری ف آروغ، آروق.

**پڕك:** ژانی منالْبون ف درد زایمان.

**پرك:** ١) برش، کەڕو، کەڕەکیفە؛ ٢) پرتك، کەموکە ف ١) کَفَك؛ ٢) اندك.

**پرکردن:** تژەکردنی والاّ ف پُرکردن.

**پڕکردنەوە:** تژەکردنی دوبارە ف دوبارە پرکردن.

**پڕکێش:** بەتەماح‌و گران‌فرۆش ف آزمند و گرانفروش.

**پڕکێشی:** سوربون‌و پێداگرتن لەسەر مەبەست ف اصرار و لجاجت.

**پرگ:** ١) پرك، کەڕو، برش؛ ٢) پارچە زەوی؛ ٣) کەرکەمەڕ ف ١) کفك؛ ٢) قطعەای زمین کوچك؛ ٣) بخشی از گلّە.

**پڕگۆشت:** قەڵەو بۆگیاندارو میوە ف گوشتالو.

**پرگە:** گەرا ف پورە، تخم حشرات.

**پرگ هەڵێنان:** کەڕوهەڵێنان، برش هەڵێنان ف کَفَك برآوردن.

**پڕمە:** ١) دەنگی لوتی یەکسم؛ ٢) گریانی لەناکاو: (لە پڕمەی گریانی‌دا) ف ١) صدای بینی اسب؛ ٢) زیر گریە زدن.

**پرمێشـــك:** ١) زاناو بەهۆش؛ ٢) نۆسەنەك، پەنێرشك ف ١) پرمغز؛ ٢) نوعی خار در گندمزار روید.

**پڕنۆ:** دەلیل، بەڵگە ف دلیل، برهان.

**پڕنۆڵ:** بزگوڕ ف تکە لباس کهنە.

**پرواندن:** بەنینۆك کڕاندن‌و لێ کردنەوە: (دامێنت قوڕاویە، وشکی کەوەو بی‌پروێنـــە، ئەم گەنمـــەشامیە بە نینۆك بپروێنە با لەلاسك بێتەوە) ف زدودن با سرانگشت.

**پروانن:** پرواندن ف نگا: پرواندن.

**پڕوپا:** لاق‌و لەتەر، داودەلینگ ف ساق و دامن بالای ساق.

**پروپاتاڵ:** ١) وردەو پردەی ناوماڵ؛ ٢) خرت‌وپرتی بێ‌نرخ؛ ٣) بێکارە، بێ‌هونەر ف ١) خرت وپرت خانە؛ ٢) اشیاءِ بی‌ارزش؛ ٣) بیکارە و تنبل.

**پڕوپوچ:** قسەو باسی بێ‌ماناو بێ‌کاکڵ‌و ناڕاست ف خُرافات، یاوە.

**پڕوپۆشتە:** تەڕپۆش، کۆك، خۆش بژیو، سازو تەیار ف مُرفّە.

**پڕو پەشێو:** بێ‌سەرو بەر، حاڵ پەرێشان ف پریشان‌حال.

**پڕوپێ:** پڕوپا ف نگا: پڕوپا.

**پڕوپیت:** وردە حاجەتی ماڵ ف خُردە اسباب خانە.

**پرۆت:** هەورگەر، کاسەوکوزەکەر، هۆستای ئامانان ف کوزەگر.

**پڕوز:** بۆنی خوری سوتاو ف بوی پشم سوختە.

**پڕوزان:** سوتانی کوڵکە خوری‌و مو ف سوختن پشم و مو.

**پڕوزانن:** سوتاندنی خوری‌و مو ف سوزاندن پشم و مو.

**پڕوزاو:** کوڵکەی سوتاو ف موی سوختە.

**پڕوزە:** خوری سوتاو ف پشم سوختە.

**پڕوزیان:** پڕوزان ف سوختن پشم و مو.

**پڕوزیاو:** پڕوزاو ف موی سوختە.

**پرۆژە:** گەڵاڵە دانان بۆکارێکی گرینگ‌و بەبەهرە ف پروژە.

**پڕوسقـــان:** ١) هەڵگەڕانی شیر، تێك‌چونی شیر لەسەر ئاگر؛ ٢) ڕەنگ پەڕین لەترسان ف ١) بریدن شیر؛ ٢) رنگ باختن.

**پڕوسقیان:** پڕوسقان ف نگا: پڕوسقان.

**پرۆسك:** پزیسك، پریشکی ئاگر ف شرارۀ کوچك.

**پروسك:** باقی‌ماوەی لەشی مردوی رزیو: (هەرئیّسكو **پروسكی** مابو) ف باقیمانده جسد پوسیده.

**پڕوسكان:** لەبەریەك هەڵوەشان ف ازهم پاشیده شدن.

**پڕوسكە:** ئاورینگ، پریشكی ئاگر، پڕوسك ف شراره.

**پروش:** چاوی كەم‌بین‌و نەخۆش ف چشم بیمار و كم‌سو.

**پروشـە:** ١) كەم‌كەم خواردن: (بـەخوا بەحاڵ پروشە دەكا)؛ ٢) دەنكە دەنكەی بەفر كە دەبارێ ف ١) كم‌كم خوردن؛ ٢) ریزش دانه‌های برف.

**پروشە پروش:** وردە وردە هاتنی بەفر بۆ زەوی ف ریزش آرام برف.

**پروكە:** دەنكی وردی بەفر ف دانهٔ ریز برف.

**پروكەپروك:** فینگەفینگ،دەنگی گریانی بەسەبرف صدای آهستهٔ گریه.

**پرونان:** پرواندن ف زدودن با سر ناخُن.

**پریاسكە:** پریّسكە، بوخچەی لەدەسرۆكە ف بقچهٔ كوچك.

**پریچ:** چاوی پروش ف چشم كم‌سو.

**پریزە:** پریاسكە ف بقچهٔ كوچك.

**پریّس:** پەرست: (پیاكێ خوا **پریّسە**) ف پَرَست.

**پریّسك:** پڕوسكە ف جرقه.

**پریّسكە:** پریاسكە ف بقچهٔ كوچك.

**پڕیش:** ریزاڵ، بزگوڕ، وردوخاش، ریشاڵ ف پارچهٔ كهنهٔ پوسیده.

**پڕیش پڕیش:** ریشاڵ ریشاڵ، ریّزاڵ ریّزاڵ ف پاره‌پاره، تكه‌تكه.

**پڕیشك:** پشكی ئاو ف پشنگ آب.

**پریشكە:** دانولەی گەنم، چیّشتی گەنم ف آش گندم جوشیده.

**پریكە:** تریقە، دەنگی بەقەوی خەنین ف صدای هرهر خنده.

**پریوان:** بەنینۆك یان بەریّك خستن وەراندن: (گەنمەشامی **بپروێنە**، جلە قوڕاویەكەت **بپروێنە**) ف با ناخن زدودن.

**پز:** ١) بیّچو لەناو زگدا، پیزە، تۆل؛ ٢) چیّژەی تفت، چیّژەی زوان گیر؛ ٣) قوز، كوز، شەرمی میّوینـە ف ١) جنین؛ ٢) گَس مزه؛ ٣) فرج، آلت تناسلی زن.

**پزان:** ١) بیّچودان، منداڵدان، پزدان؛ ٢) ئەوی منداڵ بۆگاڵتە فوی تیّدە كەن ف ١) بچه‌دان؛ ٢) بادكنك.

**پزدان:** پزان ف نگا: پزان.

**پزدوك:** چینچكە سلاّو، باپشكیّو ف گل‌مُژه.

**پززە:** نەخۆشیەكی پەزە ف نوعی بیماری گوسفند.

**پزگ:** ١) پزو، جیّگەی دۆخین لەدەرپیّ‌دا؛ ٢) هەرچیّ لیّوی هەڵدورابیّ‌و بەنی تیّدابیّ وەك زار كە كیسەو تورەكە؛ ٣) نەخۆشی مەڕ، پزو ف ١) و ٢) نیفه؛ ٣) نوعی بیماری دام.

**پزگە:** پزگ ف نگا: پزگ.

**پزڵی:** جیّگەی بیّچو لەزگ‌دا، پزدان ف زهدان.

**پزو:** ١) پزگ؛ ٢) منداڵدان، پزدان؛ ٣) پززە، فززە ف ١) تنبان؛ ٢) زهدان؛ ٣) نگا: پززە.

**پزۆر:** ورگ‌و ناو، ناوزگی حەیوان ف احشاء.

**پزۆژن:** سوژنێ كە لە تەبـەنـە دریّژتـر و لە سوژن پچـوك‌ترە ف سوزن كوچكتر از جوالدوز و بزرگتر از لحافدوز.

**پزوسك:** پروسك، پریشكی ئاگر ف شراره.

**پزوسكە:** پزوسك ف شراره.

**پزە:** فزە، نەخۆشی مەڕ ف نوعی بیماری دام.

**پزی:** ١) تفتی؛ ٢) پزگ ف ١) گس‌مزگی؛ ٢) نگا: پزگ.

**پزیسك:** ئاورینگ، نەختوكە ئاگریّك، پڕیشكەی ئاگر ف شراره.

**پزیشك:** بژیشك، حەكیم، لوقمان ف پزشك.

**پزیشكـە:** نوسـەكـە، نوسـەنـەكە، بەری گیایەكی دڕكاویە بەخوری‌و جلكەوە دەنوسیّ ف نوعی خار.

**پزیم:** ئاغزونە، ئاڵقەی داخستنی قایشی پشت‌و كەوش ف سگك.

**پزینك:** بلاّمك، دەم‌بیّنی بیّچوی ئاژاڵ ف دهان بند بچه شیرخوار حیوان.

**پژ:** ١) داسوكەی دەخڵ؛ ٢) لكی باریكی دار؛ ٣) یاڵی ولاّخ ف ١) پرز غلّه؛ ٢) جوانه نازك؛ ٣) یال.

**پژاڵ:** ١) لكی هەرە باریكی دار، پژ؛ ٢) پڕوپوش ف ١) جوانه نازك؛ ٢) خس و خاشاك.

**پژان:** ١) پرژان، بلاّوبونی وردوشل؛ ٢) خویّن لەلوت هاتن؛ ٣) نەمانی كچـیّنی؛ ٤) زۆرەوانی، ملانیّ ف ١) پاشیدن مایع؛ ٢) خون دمـاغ شُدن؛ ٣) رفتن بكارت؛ ٤) كُشتی.

**پژاندن:** ١) دەخویّن هیّنانی لوت؛ ٢) بردنی كچیّنی؛ ٣) بلاّوكردنی ورد؛ ٤) وەشـانـدن، چانـدنی تۆم ف ١) خون دمـاغ كردن؛ ٢) بكـارت برداشتن؛ ٣) پخش و پلا كردن؛ ٤) تخم افشاندن.

**پژاو:** ١) كچیّنی نەمـاو: (بنی پژاوە)؛ ٢) لوتی خویّن لیّ‌هاتـو: (لـوتی پژاوە)؛ ٣) تۆمی وەشاو ف ١) بكارت برداشته شده؛ ٢) دماغ خونی شده؛ ٣) تخم پاشیده شده.

**پژبیّن:** پشتیّن، پشتان، كەمەربەند، پشتویّن، پشتیّند ف كمر بند.

**پژتیّن:** پژبیّن ف كمر بند.

**پژك:** ١) داروكە یەكە بۆ پینە دەمەشكەی كون‌بوی ڕادەكەن، پشك؛ ٢) خونچە، پشكۆژ ف ١) پینهٔ چوبی سوراخ مشك؛ ٢) غنچه.

**پژكۆژ:** پشكۆژ، خونچە ف غنچه.

**پژگاڵ:** كاروبار، مەشغولیەت ف سرگرمی و مشغولی.

**پژل:** سوُر لەسەرشتیّ ف اصرار، ابرام.

**پژلاندن:** سوُربون ویاداگر تن لەسەرشتیّ ف اصرار كردن.

**پژم‌وهوڕ:** پژمەی بەقەو، توندپشمین ف عطسهٔ قوی.

**پژمە:** پشمە، پنژە ف عطسه.

**پژمەپژم:** پشمەی لەسەر یەك ف عطسهٔ پیاپی.

**پژمین:** پنژین، پشمین ف عطسه‌كردن.

**پژن:** ١) بەلكوپۆپ؛ ٢) پرچن‌و موتیّكەلاّو ف ١) درخت پرشاخ و برگ؛ ٢) ژولیده‌مو.

**پژنچە:** قاشاق، ڕنەكی یەكسم ماڵین ف برس ستور.

**پژو:** یاڵ، موی ملی یەكسم‌و شیّر، بژ ف یال.

**پژوپـۆ:** لق‌وپـۆپ، ئەولكـانـەی هەڵـدەپـەرتیّودریّن ف شاخه و برگ،

شاخه‌های هرس شدنی.

**پژون:** گزره [ف] علف پرس شده.

**پژوێن:** پژبێن [ف] کمر بند.

**پژوێنه:** پزبێن [ف] کمر بند.

**پژه:** پریشکه پریشکی ئاو [ف] پاشیده شدن آب.

**پڕیاگ:** ۱) پژاو، لوتی خوێن لێهاتـو؛ ۲) کچێنی له‌بەین‌چو؛ ۳) تۆمی چناو [ف] ۱) خون دماغ شده؛ ۲) بکارت برداشته شده؛ ۳) تخم پاشیده شده.

**پژیان:** پژان [ف] نگا: پژان.

**پس:** ۱) قەتین، قەتیان؛ ۲) تور، ئەوی لەباتی س، **ث** دەڵێ، پسك؛ ۳) کوڕ، فرزەندی نێر: (**پسمام:** ئامۆزا) [ف] ۱) گسلیدن؛ ۲) کسی که «س» را «ث» تلفظ کند؛ ۳) پسر.

**پسات:** جوات، ناوکۆمەڵ، جەرگەی حەشامات: (بۆتە پەندی **پساتێ**) [ف] اجتماع.

**پسان:** ۱) قەتیان، لەبەر یەك چونی بەن‌و داو؛ ۲) مردن لەبەر ماندویی [ف] ۱) گسستن؛ ۲) از خستگی مُردن.

**پساندن:** لەبەریەك بردن [ف] گُسلانیدن.

**پسانك:** بێچو: (**پسانکه** سەگ: توتەڵەسەگ) [ف] بچّه.

**پسانن:** پساندن [ف] نگا: پساندن.

**پسانەوه:** ۱) دوباره لەبەریەك چون؛ ۲) دوایی هاتن: (ئەوەچبو؟ هەر نە**پسایەوە**) [ف] ۱) دوباره گسستن؛ ۲) خاتمه یافتن.

**پسپان:** ۱) پینەی پەڕۆ؛ ۲) سرتە، قسەی بەئەسپایی [ف] ۱) پارچهٔ پینه؛ ۲) حرف در گوشی.

**پسپاندن:** سرتەکردن، سرکاندن [ف] حرف در گوشی.

**پسپس:** ۱) زۆرپچڕاو، بەچەندجێ لەت؛ ۲) وشەی بانکردنی پشیله [ف] ۱) پاره‌پاره شده؛ ۲) کلمه صدا زدن گربه.

**پسپستلێ:** جوڵاتەنە، جاڵ جاڵۆکە [ف] عنکبوت.

**پسپسیك:** پشیله، پسیك، پشی، کتك [ف] گربه.

**پسپـوڕ:** ۱) زانـالـە پەزنـاسـین‌دا؛ ۲) چازان‌و لێزانی کار [ف] ۱) گوسفندشناس؛ ۲) خبیر و کاردان.

**پسپوڕی:** چازانی. هۆزان لەکارێکا [ف] خبرگی. تخصص.

**پست:** سرتە، سرکە [ف] حرف در گوشی.

**پستان:** فستان، کراسی ژنانە [ف] پیراهن زنانه.

**پسترك:** پەیژە، ناردیوان [ف] نردبام.

**پستو:** بەرۆك، یەخە [ف] گریبان.

**پسته:** ۱) فستق؛ ۲) سرتە، چپە [ف] ۱) پسته؛ ۲) درگوشی.

**پستەبادام:** بادامی کاغەزی، باوی تیکوڵ ناسك [ف] پسته بادام.

**پستەپست:** سرتەسرت، پچەپچ [ف] پچ‌پچ.

**پستەق:** مێوژی خراپ [ف] مویز بنجل.

**پســـك:** ۱) کەسێ زمـانی «سین» و «زێ» ناهێنی، پس؛ ۲) پشیله؛ ۳) بسك، زولف [ف] ۱) کسی که «س» را «ث» تلفظ کند؛ ۲) گربه؛ ۳) گیسو.

**پســکـــان:** دەگەڵ پێشگـــری ڕا دەیڵێن. خۆ ڕزگارکـــردن لە کەسێ کەتوندگرتویە: (خۆی لەدەستم را**پسکاند**) [ف] فرار کردن.

**پسکول:** گوڵینگی کڵاو [ف] منگولهٔ کلاه.

**پسکه:** ۱) سرکە، سرتە، قسە بەدەنگی نزم؛ ۲) پارێزی راوچی بۆ نچیر؛ ۳) باڵـەفـڕەو جیوەجیوی بەچکـەمـەل لەکاتی خواردن لەدەندوکی دایکی‌ڕا [ف] ۱) حرف در گوشی؛ ۲) خیز شکارچی به‌طرف شکار؛ ۳) پرپر زدن بچهٔ پرنده وقت خورن.

**پسکـەپسك:** ۱) سرتەسرت؛ ۲) باڵەفڕەو جیك‌جیكی جوچك [ف] ۱) نجوا؛ ۲) پرپرزدن و سروصدای بچهٔ پرنده.

**پسکیان:** پارێزبردنی راوچی [ف] خیز شکارچی بسوی شکار.

**پسڵ:** لۆشه، گیایەکە لەدۆکڵیوی دەکەن [ف] گیاهی است که در دوغبا ریزند.

**پسمام:** ئامۆزای نێر، کوڕمام [ف] پسرعمو.

**پسنچك:** پنچك [ف] بوتهٔ درختی.

**پسو:** هەست [ف] احساس.

**پسمیران:** بەچکەبەگ، نەجیم‌زادە [ف] نجیب‌زاده.

**پسوك:** بەنی ناقایم کەزو دەپسێ [ف] نخ نازك نامحکم.

**پسـوگـرتەی:** گوێ‌ڕادێری لەقسـەی خەڵك هـەست‌ڕاگـرتن [ف] استراق‌سمع.

**پسەپس:** ۱) تورەتور؛ ۲) سرتەسرت [ف] ۱) حالت لُکنت زبان؛ ۲) پچ‌پچ.

**پسیان:** قەتیان، پسان [ف] گسستن.

**پسیزك:** پزیسك [ف] نگا: پزیسك.

**پسیك:** پشیله، پشی [ف] گربه.

**پسێن:** ۱) ئەوی دەپسێنێ؛ ۲) کڕیار [ف] ۱) گسلنده؛ ۲) خریدار.

**پسیوز:** پسپوڕ [ف] نگا: پسپوڕ.

**پش:** ۱) فشـەڵۆك، ناپتەو؛ ۲) سی، جەرگی سپی، کیسەی هەناسە؛ ۳) وشـەی بانـگ‌کردنی پشیله [ف] ۱) شل و ول؛ ۲) ریه؛ ۳) کلمه صدا کردن گربه.

**پشاقیك:** سوێنکە سابون [ف] تەماندهٔ صابون.

**پشاوتن:** گلۆفین، هەڵپشاوتن، تێك‌هەڵگوشین‌ولێك‌دان [ف] مُچاله کردن.

**پشپش:** وشەی بانکردنی پشیله [ف] کلمه صدا کردن گربه.

**پشپشۆکه:** گیایەکە لە کلکەپشیلەئەچێ [ف] گیاهی است شبیه به دم گربه.

**پشپێنت:** پژبێن [ف] کمر بند.

**پشت:** ۱) لەدواوە لەشانرا تاسەر ڕان؛ ۲) ئەو دیوی هەرشتێ؛ ۳) خزمی باوك؛ ۴) داژدارو لاگر؛ ۵) وشـەی دەرکردنی پشیله؛ ۶) بەرەوچین: (**پشت بەپشت** واهاتوین)؛ ۷) حیز، پیاوی گاندەر [ف] ۱) پُشت؛ ۲) وراء؛ ۳) خویشـاونـد پدری؛ ۴) طرفـدار؛ ۵) کلمه راندن گربه؛ ۶) نسل؛ ۷) اُبنه.

**پشتاش:** تۆزی ئارد لەئاشدا، تۆز ئاسیاو [ف] گَرد آسیاب.

**پشتان:** ئاوقا، دەست تێ‌وەرێنان [ف] در آغوش گرفتن.

**پشتاو:** ۱) جۆرێ دەمانچەی قەدیم؛ ۲) تۆرەکەی باروتی راوچی ف ۱) نوعی تپانچه؛ ۲) تو برهٔ باروت.

**پشتـاوپشت:** ۱) بابـەلبـاب، بەرە لەدوی بەرە؛ ۲) پێچەوانە رۆیشتن: (**پشتاوپشت** چومە ناو ئەشکەوتەوە) ف ۱) نسل در نسل؛ ۲) عقب عقب رفتن.

**پشتئەستور:** خاترجەم، بێ‌نیگەرانی ف خاطرجمع.

**پشتبێن:** پژبێن ف کمر بند.

**پشت پێ بەستن:** خاترجەم‌بوُن لە یارمەتی کەسێك ف اطمینان یافتن از یاری کسی.

**پشـت تێکــردن:** ۱) رولـێ وەرگێران؛ ۲) گوێ پێ نەدان: (**پـشـتـی** دەکارەکەی **کردوە**) ف ۱) اعراض و پشت کردن؛ ۲) بی‌اعتنایی.

**پشت چوڤك:** دارگورد، ئەودارە پۆی تەونی پێ‌دەکوتن ف چوبی که با آن پودقالی را می‌کوبند.

**پشتخوُیل:** پشت کوُڕ، پشت چەمیو ف کوژپشت.

**پشتدار:** ۱) قایم، پتەو؛ ۲) خاوەن داژدارو لاگری بەهێزو دەسەلات ف ۱) محکم؛ ۲) کسی که پارتی بانفوذ داشته باشد.

**پشتدان:** ۱) هەلاتن لەبەر دوژمن؛ ۲) تەسمیل بونی مێوە بۆنێرە ف ۱) فرار از دشمن؛ ۲) تمکین ماده برای نرینه.

**پشت دانــەوە:** ئارخـەیانو بێ‌خەم‌بوُن: (**برۆ پشتی** خۆتی **لێ‌بدەوەو** مەترسە) ف آرامش یافتن.

**پشترێژ:** برینی پشتی یەکسم ف زخم پشت ستور.

**پشترێش:** پشترێژ ف زخم پشت ستور.

**پشت ساردبوُنەوە:** ناهومێدبوُن لەکار ف مأیوس شدن.

**پشتشکان:** برێتی لە بەلای زۆر گەورە: (**برارۆ پشتم‌شکا**) ف کنایه از مُصیبت بزرگ.

**پشتکوُڕ:** پشت خوُیل ف کوژپشت.

**پشتکۆل:** داری پشت دەرگا بۆداخستن ف چوب پشت در.

**پشت کوم:** پشت‌خوُیل ف کوژپشت.

**پشت گرتن:** یارمەتی‌دان، داژداری کردن ف حمایت کردن.

**پشتگوێ‌خستن:** گوێ پێ‌نەدان، وەدواخستن ف پشت گوش انداختن.

**پشتگوێکردن:** ۱) برێتی لە سەرچاك کردن لای دەلاك؛ ۲) موهەلگرتنی لاملی ژن ف ۱) اصلاح موی سر؛ ۲) موی صورت گرفتن زنان.

**پشتگین:** دوماهی، ئاخری ف واپسین.

**پشتلێدان:** گەمەیەکە شەڕە پشت ئەکەن ف نوعی بازی.

**پشتلێدانەوە:** ئاسودەبون، ئیسراحەت کردن ف لم دادن.

**پشتلێکردنەوە:** پشتلێدانەوە ف لم دادن و آسودن.

**پشتمێر:** هاریکار، یاریدەر ف یاری کننده.

**پشتوپەنا:** جێگەی بانگو هاوار ان: (غەوس **پشتوپەنات بێ**) ف پُشت پناه.

**پشتوری:** ورە، هێزی دل ف قوّت قلب.

**پشتوێن:** پژبێن ف کمر بند.

**پشتە:** ۱) کۆلو بار، باری کۆل؛ ۲) پك، لای کوُڕی میچ، جك لەسەر زك؛ ۳) وشـــەی دەرکــردنی پشیلە؛ ۴) نێری گانـدەر، پشت؛ ۵) ناوی گوندێکە لەسەر سیروان؛ ۶) تیکولْ فرێدانی ئاولە؛ ۷) هاوعەشیرەت ف ۱) کولەبار؛ ۲) طرف برجستهٔ شتالنگ؛ ۳) کلمهٔ راندن گربه؛ ۴) اُبنه؛ ۵) نام دهی است؛ ۶) پوست انداختن زخم؛ ۷) هم‌خونی.

**پشتەپا:** شەق، تێهەلدان ف تیپا.

**پشتەپێ:** پشتەپا ف تیپا.

**پشتەرێژە:** پشترێژە ف زخم پشت ستور.

**پشتەرێشە:** پشتەرێژە ف زخم پشت ستور.

**پشتەسور:** پشت ئەستور ف نگا: پشت ئەستور.

**پشتــەســەر:** خشلێکـە ژنـان لەنـاوەراستی سەری دەدەنو بەپشتـا بەردەبێتەوە ف زیوری است زنانه.

**پشتەك:** ۱) پشتیوانەی دیوارو دار بۆ قایم بون؛ ۲) تیسکە خوری کە هەلی ناپاچنو دەیهێلنەوە ف ۱) پشتیبانه؛ ۲) پشمی که بر پشت قوچ می‌ماند.

**پشتەکی:** سواربونی یەکسم: (**دوپشتەکی**) ف سوار شدن بر ستور.

**پشتەمازە:** موغەرەی پشت، تیغەرەی پشت ف ستون فقرات.

**پشتەماسی:** خەرپشتە، سەربانی کوُرەوەك پشتەماسی ف بام خرپشته.

**پشتەملە:** بێگار، کاری بەزۆرداری بۆزۆردار ف کار بیگاری.

**پشتەملێ:** پشتەملە ف بیگاری.

**پشتەمەلە:** جۆرێ سۆبایی، مەلەی لەسەر گازی پشت ف شنای پشت.

**پشتەمێر:** پشتمێر ف نگا: پشتمێر.

**پشتەوە:** دواوە ف وراء، پشت.

**پشتەوەشکێن:** بەلای پشتەوە داچەماو ف بەطرف پشت خم شده.

**پشت هەلکردن:** قەلس بون، رووەرگێران ف پشت کردن و عصبانی شدن.

**پشت هەیوان:** ئۆدەی لەرِوی هەیوان ف اطاق رو بەتراس.

**پشتەیوان:** پشت هەیوان ف نگا: پشت هەیوان.

**پشتــی:** ۱) سەرین؛ ۲) پالــەوپشت؛ ۳) کۆل، باری پشتی پیاو؛ ۴) لەدوای: (**پشتی تۆ** من دێم) ف ۱) بالش؛ ۲) متکێ؛ ۳) کولەبار؛ ۴) پس از.

**پشتیر:** تەویلە، تەولە، گەوەڕ ف طویله، اصطبل.

**پشتێر:** پشتیر ف طویله، اصطبل.

**پشتێن:** ۱) پژبێن؛ ۲) گشتەك ف ۱) کمر بند؛ ۲) نخ بهم بافته.

**پشتێند:** پژبێن ف کمر بند.

**پشتێنــــدە:** ۱) دەورە، دەورەگرتنی پەرژین یا هەرچی؛ ۲) داری دەنـاو شوُلی چەپەر خراو؛ ۳) جۆرێ زۆرەوانیە کە دەست دەکەمبەری یەکتر دەگرن ف ۱) کمر بندی؛ ۲) پودِ پرچین؛ ۳) نوعی کُشتی.

**پشتێنە:** پشتێندە ف نگا: پشتێندە.

**پشتیوان:** ۱) هاریکـــار، یاریدەر؛ ۲) قایم‌کەری دیواری شکست؛ ۳) داری دەرگاداخستن ف ۱) پشتیبـان؛ ۲) پشتیبـانـەدیوار؛ ۳) چوب پشت در.

**پشتیوانە:** دیواری دیوار ئەستێنەوە ف پشتیبانه.

**پشتیوانی:** یاریدەدان، هاریکاری، لاگیری ف پشتیبانی.

**پشتیوانی کردن:** دژداری کردن، لاگیری کردن ف طرفداری کردن.

**پشرّون:** چێشتی پیرخەنیلە، شیوی وردە ساوار ف آش بلغور ریز.

**پشقل:** پشکەڵ، کشپەڵ، کشپل، قشپل، گوُی دوسمو وشترو کەروێشك ف پشك حیوانات.

**پشك:** ۱) خونچەی گوڵی‌دار؛ ۲) پژك، داری کونگری مەشکەو خیگە؛ ۳) دەنکی بەفر، کلوی بەفر؛ ۴) پسولەی خۆوبەخت، قورعە؛ ۵) بەش وبار؛ ۶) پڕیشکی ئاو ف ۱) شکوفە درخت؛ ۲) پینۀ چوبین مشك؛ ۳) دانۀ برف؛ ۴) بلیط بخت‌آزمایی؛ ۵) سهم و قسمت؛ ۶) قطرات پاشیدۀ آب.

**پشکخستن:** قورعەکێشان ف قُرعە انداختن.

**پشکڤین:** ۱) پشکوتنی خونچە؛ ۲) هەڵوەشانی درومان، هەڵپشکوتن ف ۱) شکفتن غنچە؛ ۲) بازشدن بخیە.

**پشکڵ:** پشقل ف پشك حیوانات.

**پشکن:** ۱) مفەتیش، ماڵ پشکن؛ ۲) لەبەریەك جیا کەرەوە: (خوریەکە بپشکنە) ف ۱) مفتّش و بازرس؛ ۲) ازهم بازکنندۀ پشم و موی.

**پشکنین:** ۱) گەڕان و تەفتیش؛ ۲) هەڵوەشاندنی خوری و لۆکە ف ۱) تفتیش؛ ۲) ازهم بازکردن پشم و موی.

**پشکۆ:** پۆلو، پەرەنگ، سکڵ، پەنگر ف اخگر.

**پشکوتن:** وەبونی خونچە ف بشکفتن.

**پشکوُڕ:** پشتکوُڕ ف کوژپشت.

**پشکۆژ:** ۱) خونچە؛ ۲) دوگمە، قۆبچە؛ ۳) گوڵوك ف ۱) غنچە؛ ۲) دکمە؛ ۳) شکوفۀ درخت.

**پشکول:** تەژەی ناقۆڵا ف تنومند بدقوارە.

**پشکۆڵ:** پشقل ف پشك حیوانات.

**پشکەڵ:** پشقل ف پشك حیوانات.

**پشکیل:** ئەنگوستیلەی بێ‌نقێم کە لەگاڵتەی کەڵەمستێن‌دا بەکاری دێنن ف انگشتری بی‌نگین.

**پشکیلان:** گەمەی کەڵەمستێن، *بازیەکی شەو نشینیە کە ئەنگوستیلە لەباخەڵی یەکێك‌دا دەشارنەوە دەستەی‌تر دەبێ بیدۆزنەوە* ف نوعی بازی دستەجمعی.

**پشکێن:** پشکن ف بازرس.

**پشکیك:** چەڵتوك، برنجی بەتیکوڵەوە ف شالی.

**پشمە:** پژمە، پنژە ف عطسە.

**پشمین:** پنژین، پشمەکردن، پژمین ف عطسەکردن.

**پشنی:** توێڵ، هەنیە، ئەنی، ناوچاوان ف پیشانی.

**پشو:** ۱) هەناسە؛ ۲) پشیلە؛ ۳) ئیسراحەت، وچان ف ۱) نَفَس؛ ۲) گربە؛ ۳) استراحت کردن.

**پشۆر:** خراب گوتنی کەسێ، نەحلەت ف بدگفتن از کسی، نفرین.

**پشوسواری:** تەنگەنەفەسی ف نفس‌تنگی.

**پشوگرتن:** وچاندان، ئیسراحەت کردن ف آسودن.

**پشە:** ۱) پڕیشکی ئاو؛ ۲) پشیلە ف ۱) قطرات پاشیدۀ آب؛ ۲) گربە.

**پشی:** ۱) پشیلە؛ ۲) کەپەکی ئارد؛ ۳) سی، جگەری سپی؛ ۴) کولیچە بەرۆن؛ ۵) پشو، نەفەس ف ۱) گربە؛ ۲) نخالۀ آرد؛ ۳) شُش؛ ۴) نان روغنی؛ ۵) نفس.

**پشیان:** پڕژانی ئاو، پریشکە کردن ف پاشیدن آب.

**پشی‌پشی:** ۱) گەمەیەکی منالانە؛ ۲) بانگ کردنی پشیلە ف ۱) نوعی بازی بچەها؛ ۲) صدا زدن گربە.

**پشیك:** پشیلە ف گربە.

**پشیلۆك:** پشیلەپایزە ف گیاه قاصدك.

**پشیلە:** کتك، *جانەوەرێکی لەتیرەی پڵنگ بەڵام پچوك*، *دڕندەیشی هەیەو کەویشی هەیە، بەنێرەکەی ئێژن گورپە* ف گربە.

**پشیلەپایزە:** بەری گیایەکە با دەیباو منال بۆ گاڵتە دوای دەکەون ف قاصدك.

**پشیلەسوُرە:** گەمەیەکی منالانە ف نوعی بازی کودکان.

**پشیلەسوُرێ:** پشیلە سوُرە ف نگا: پشیلەسوُرە.

**پشیلەشۆر:** شوشتنی ناتەواو، شۆرینی سەرچڵ ف سرسری شُستن.

**پشێو:** پەشێو، پەرێشان، نەباش ف پریشان حال.

**پشێوە:** ئاژاوە ف آشوب.

**پشێوی:** ئاژاوە ف آشوب.

**پشێوی‌نانەوە:** کەتن‌گێڕی، ئاژاوەنانەوە ف فتنەانگیزی.

**پشێوێنی:** پشێوە ف آشوب.

**پف:** ۱) فو؛ ۲) وشەی وەڕەزی لەبۆنی ناخۆش: (پف لەو بۆگەنە)؛ ۳) وشەی گاڵتە بەقەڵەوی زگ‌زل کردن ف ۱) پف؛ ۲) کلمۀ نفرت از بوی بد؛ ۳) کلمۀ مسخرە کردن بە شکم گندە.

**پف‌دان:** ۱) فودان، بەفوتێکردن هەڵامساندنی کەلاك؛ ۲) برێتی لە پێهەڵگوتنی بەدرۆ ف ۱) دمیدن؛ ۲) کنایە از ستایش دروغین.

**پفدراو:** ۱) دنەدراو، هانەدراو؛ ۲) کەلاکی بە فوُهەڵمساو ف ۱) تحریك شدە؛ ۲) لاشۀ در کعب دمیدە.

**پفدریاگ:** پفدراو ف نگا: پفدراو.

**پفدریان:** فودان ف پُف‌دادن.

**پفکردن:** فوکردن لە ئاگر و هەرچی ف پُف کردن.

**پفکرن:** پفکردن ف پف کردن.

**پفکێ:** جوێنی ژنانەیە، واتا: گوشاد ف دُشنام زنانە.

**پفڵدان:** مسوڵدان ف مثانە.

**پفنە:** کورتەباڵای قەڵەو ف کوتاەقد چاق.

**پفوڵە:** کورتەباڵای قەڵەو، پفنە ف نگا: پفنە.

**پفە:** چێشت لەزمانی منالاندا ف آش بە زبان بچەگانە.

**پفەك:** ئامرازی فوی توند کردن ف ابزار دَمیدن، دَم.

**پفەڵ:** فشەڵۆك ف متخلخل.

**پفەڵدان:** فودان، فوتێکردن ف پُف دادن.

**پفەڵدراو:** فودراو، باتێکراو ف پُف دادە.

**پفیو:** لەشگران و تەمەڵ ف تنبل و لش.

**پك:** پشتەی جك، بەرانبەرجك ف بر رو افتادن شتالنگ.

**پك‌پك:** نوزه‌نوزی منداڵ به‌ده‌م گریانه‌وه ف غرولند بچه موقع گریستن.

**پكنه:** پفنه ف نگا: پفنه.

**پكه:** ۱) پشته‌ی میچ، پشته‌ی قاپ؛ ۲) فه‌رمانی كردن ف ۱) دَمَر افتادن قاپ بازی؛ ۲) امر به كردن.

**پكه‌ن:** ۱) فه‌رمانی كه‌ندن؛ ۲) فه‌رمانی كردن بۆكۆی مرۆ؛ ۳) فه‌رمانی داكه‌ندن ف ۱) امر به كَنْدَن؛ ۲) امر به كَرْدَن برای جمع؛ ۳) امر به لباس درآوردن.

**پكه‌ین:** ئه‌نجام بده‌ین ف بكنیم.

**پكێش:** فه‌رمانی راكێشان ف امر به بِكَش.

**پكێشه:** ۱) دۆكه‌ڵ ده‌گه‌روت كه، هه‌ڵمژه؛ ۲) ڕاكێشه ف ۱) بركَش؛ ۲) بكش.

**پگر:** گه‌مره، كه‌مره ف سرگین خشك شده.

**پل:** ۱) تكـه، پارچـه گۆشتی چكـۆڵه، چنچك؛ ۲) په‌نجه: (ده‌سو پلت بشـۆ)؛ ۳) قامـك؛ ۴) بادان، باوخواردن؛ ۵) ته‌زوی له‌ش، بروسكه پێداهاتن؛ ۶) چه‌قه‌نه به په‌نجه؛ ۷) لكی باریكی‌دار: (لق‌و پـل)؛ ۸) په‌لكه، كه‌زی؛ ۹) به‌له‌ك: (پاو پل)؛ ۱۰) پێل، پرد؛ ۱۱) لێدانی ره‌گ ف ۱) چنجـه؛ ۲) پنجـه و دست؛ ۳) انگشت؛ ۴) تاب خوردن؛ ۵) تیركشیدن بدن؛ ۶) بشكن؛ ۷) جوانه نازك درخت؛ ۸) گیسو؛ ۹) ساق پا؛ ۱۰) پُل؛ ۱۱) نبض.

**پڵ:** ۱) په‌ڵه‌ی پێست؛ ۲) پرد ف ۱) لكهٔ پوست؛ ۲) پُل.

**پلار:** ۱) دارده‌ستێ كه بۆهاویشتن ده‌بێ؛ ۲) قسه‌ی به‌تێكوڵ؛ ۳) تانه‌و سه‌ركۆنه ف ۱) تكه‌چوب انداختنی؛ ۲) متلك؛ ۳) سرزنش.

**پلارتێگرتن:** ۱) دارهاویشتن بۆمیوه ته‌كاندن؛ ۲) داربه‌كه‌سێك دادان؛ ۳) سه‌ركۆنه‌و قسه‌ی به‌تێكوڵ كردن ف ۱) انداختن تكه چوب برای میوهٔ درخت؛ ۲) چوب بطرف كسی پرت كردن؛ ۳) متلك گفتن.

**پڵاس:** به‌ڕه‌ی ده‌زو، رایه‌خی كه‌م‌نرخ ف پلاس.

**پڵاس ماسی:** جۆرێك ماسی ف نوعی ماهی.

**پڵاش:** گیای وشكی ده‌شتی، پوش‌و پڵاش ف گیاه خشك باد برده.

**پلان:** گه‌لاڵه‌كار، كه‌ین‌و به‌ین ف طرح، نقشه.

**پڵان:** ۱) هه‌ستی، ئیسقان؛ ۲) گلاربون ف ۱) استخوان؛ ۲) غلتیدن.

**پڵاندن:** گلاندن، گلاركردنه‌وه ف غلتاندن.

**پڵانن:** پڵاندن ف نگا: پڵاندن.

**پڵاننه‌وه:** پڵانن ف نگا: پڵانن.

**پڵاو:** چێشتی برنجی به‌پاڵوێنه پاڵێوراو ف پلو.

**پڵاوپاڵا:** پاڵوێنه‌ی برنج، سوزمه، ده‌فرێكی كانزای كون‌كون ف پلو پالا.

**پڵاوپاڵێو:** پڵاوپاڵا ف پلو پالا.

**پڵپ:** ۱) شل‌و شه‌ویق‌و نه‌بـه‌گه؛ ۲) توندو خۆگر ف ۱) شل و لق؛ ۲) ثابت و محكم.

**پڵپ به‌ستن:** مه‌یین، توندبونی شل ف منعقد شدن و بستن.

**پل پسكیان:** نه‌خوشیه‌كی باڵدارانه ف نوعی بیماری پرندگان.

**پلپل:** له‌ت‌له‌تی چكۆڵه، ئه‌نجناو ف انجیده.

**پلپل كردن:** پارچه‌پارچه كردن. بۆ گۆشت ده‌ڵێن ف قیمه‌كردن.

**پلپله:** پپله، خشڵێكه ف زیوری است.

**پڵپڵه:** پپله ف زیوری است.

**پڵپڵی:** په‌ڵه‌په‌ڵه، په‌ڵاوی ف لكه‌لكه.

**پل‌پیز:** لنگ‌و له‌ته‌ر، داوده‌لینگ ف ساق و پوشش ساق.

**پلت:** په‌ڵه، پلتا عه‌ورال ئه‌زمێن دخویان ف نگا: په‌ڵه.

**پڵت:** ۱) بل، نه‌رم‌و شل؛ ۲) ده‌نگی به‌زۆر ده‌رهێنانی زاربێنی شوشه‌ئاو ف ۱) شُل؛ ۲) صدای بیرون آوردن دهان‌بند بُطری.

**پڵتك:** پڵتۆك ف تلنگُر.

**پڵتۆخ:** نه‌به‌گه، یه‌كتر نه‌گرتو، شل‌و شه‌وێق ف شل و بند نیامده.

**پڵتۆك:** ۱) پته، به‌پشتی په‌نجه له‌شتێك دان؛ ۲) پێی تفه‌نگ‌و ده‌مانچه ف ۱) تلنگر؛ ۲) ماشهٔ تفنگ و تپانچه.

**پڵته:** ۱) ده‌نگی ده‌ركێشـانی زاربـه‌ندی شوشه‌ئاو؛ ۲) تڵته، تڵف ف ۱) صدای بیرون آوردن چوب‌پنبه بطری؛ ۲) دُردی.

**پل‌ته‌قانن:** چه‌قه‌نه‌لێدان ف بشكن زدن.

**پلتیك:** رزیو، رزیای ف پوسیده.

**پلچ:** فلچ، تلیخاو، پلیخاو ف له شده.

**پڵچاندن:** تلێخاندن ف له‌كردن.

**پڵچانن:** پڵچاندن ف له‌كردن.

**پلدان:** ۱) لێدانی نه‌بز به‌توندی؛ ۲) په‌ڕینی ئه‌ندام وه‌ك په‌ڵكی چاوو لێو ف ۱) زدن نبض؛ ۲) اختلاج و پریدن اعضا.

**پڵژ:** سیس، كز ف پژمرده و افسرده.

**پڵژیاگ:** سیس‌و كزبوگ ف پژمرده.

**پڵژیان:** سیس‌و كزبون ف پژمردن و افسردن.

**پلشت:** چڵكن، پیس، چڵكاوی ف كثیف و چرك‌آلود.

**پلك:** ۱) خوشكی باوك، پور؛ ۲) كه‌زی، پرچ؛ ۳) پلشت، چڵكن، گه‌مار؛ ۴) گلان، پل ف ۱) عمّه؛ ۲) گیسو؛ ۳) چركین؛ ۴) غلتیده.

**پلكان:** گلاربون ف غلتیدن.

**پلكانن:** گلاندن ف غلتانیدن.

**پلكه:** ۱) بسك‌و كه‌زی؛ ۲) خوشكی باوك ف ۱) گیسو؛ ۲) عمّه.

**پلكیان:** گلان، خلۆربونه‌وه ف غلتیدن.

**پل‌لێدان:** چه‌قه‌نه به‌قامك ف بشكن زدن.

**پڵمه:** ۱) گریانی له‌نكاو؛ ۲) كه‌نینی به‌ده‌نگ، پرمه ف ۱) گریهٔ ناگهانی؛ ۲) قهقهه.

**پلندار:** داروكه‌ی هاویشتنێ، پلار ف نگا: پلار.

**پڵنگ:** ۱) دڕنده‌ی به‌ناوبانگ؛ ۲) تێكه‌ڵ پێكه‌ڵ‌و ئاڵۆز ف ۱) پلنگ؛ ۲) درهم برهم.

**پڵنگیان:** ئاڵۆزان‌و تێك‌هاڵان ف درهم برهم شدن.

**پلوپا:** ۱) قاچ‌و قول، لنگ‌و له‌ته‌ر؛ ۲) په‌له‌قاژه، حه‌ول‌و ته‌قالا ف ۱) پا و ساق؛ ۲) دست و پا زدن.

**پلوبۆ:** وزه‌و هێز، توان‌و تاقه‌ت ف تاب و توان.

**پلوپوش:** پڕوپوش، وشكه‌گیا ف خشكه گیاه.

**پڵوپوُش:** پلو پوش ف خشکه گیاه.

**پڵوچ:** خواروخێچ: (پێچو **پڵوچ**) ف کج‌وکوله.

**پڵۆخ:** ۱) پڵیشـاو، رزاو؛ ۲) پیس‌و چڵکن ف ۱) له و ازهم پاشیده؛ ۲) چرك‌آلود و کثیف.

**پڵۆخ:** سکڵ ف اخگر.

**پڵوُر:** ۱) بلوێر، بلور، نای؛ ۲) پلوسك، لوس ف ۱) نی‌لبك؛ ۲) ناودان.

**پڵورژەن:** بلوێرلێدەر، بلوێر بێژ، نای‌زەن ف نی‌نواز.

**پلوره:** ۱) خەڵێف، جێگەی هەنگ؛ ۲) پلوسك ف ۱) کندوی عسل؛ ۲) ناودان.

**پلۆز:** ۱) پڕپـوڵـه، چێشتی گزموله هەویر و کوُزەڵه؛ ۲) گزموله‌هەویری دانی جوچکه ف ۱) آش اوماج؛ ۲) آرد آبزده برای خوراك جوجه.

**پڵۆز:** تیکەڵ پێکەڵ: (کاره‌که ئاڵۆز **پڵۆز**بوه) ف قاطی‌پاتی.

**پلوسك:** لوس، لوساوك، پلور ف ناودان.

**پلوسکه:** گەرولەی ئاش ف گلوی گندم ریز در آسیا.

**پلوسگرد:** پەرەسێلکه، حاجی‌رەشك ف پرستو.

**پڵۆسین:** دوای پێشکری«دا». دارکاری کردن، لێدان به توندی ف کتك‌کاری.

**پلوُل:** بلور، بلوێر ف نی‌لَبك.

**پله:** ۱) خوشـــکـی باوك؛ ۲) دەرەجـــه، پایه؛ ۳) هەل‌و دەرفـــەت؛ ۴) پێ‌بیلکەی نەردیوان؛ ۵) پته، بەقامك لەشت‌دان ف ۱) عمّه؛ ۲) درجه و پایه؛ ۳) فرصت؛ ۴) پله؛ ۵) تلنگر.

**پله‌پەرتکێ:** پەلەپروزه، گەلەك بەلەز ف شتابزدگی.

**پله‌ترازیان:** پەژیوان‌بون، پاشکەزبون ف پشیمان شدن.

**پله‌تسیان:** ۱) سست‌بوُنەوەو خاو بوُنەوه؛ ۲) پەشیمان‌بون ف ۱) سست شدن؛ ۲) پشیمان شُدن.

**پله‌زیقان:** چەقەنەلێدان‌و سەماکردن ف پایکوبی و بشکن زدن.

**پله‌کان:** قالدرمه، دەرەج ف پلّه.

**پله‌کانه:** پله‌کان ف پلّه.

**پله‌گۆشت:** چنچك، پارچه‌گۆشت ف قطعه گوشت.

**پله‌ندەر:** ۱) بێ‌ئابڕو، روسیا؛ ۲) شەڕانی، بێ‌فەڕ ف ۱) بی‌آبرو؛ ۲) ستیزه‌جو.

**پڵیته‌کێش:** داروکەی چرای ڕۆن گەرچەك ف فتیله‌کش.

**پڵیخ:** رزین، دەبەر پێ‌دا فلچ ف لەشده.

**پڵیخان:** دارزان، فلچەوەبون ف لهیدن.

**پڵیخاو:** دارزاو ف لهیده.

**پلیزرگ:** پلوسگر، پەرەسلێرکه ف پرستو.

**پلیسرك:** پلیزرگ ف پرستو.

**پلیش:** فلچ، پڵیخ ف لهیده.

**پڵیشان:** پڵیخان ف لهیدن.

**پڵیشاندنەوه:** دەبەر پێ‌دا پان کردنەوه ف له کردن.

**پڵیشانەوه:** فلچ بوُنەوه ف لەشدن.

**پڵیشاو:** لەبەر یەك چو، پان‌و فلچ‌بوەوه ف لەشُده.

**پڵیشاوه:** پڵیشاو ف لەشده.

**پلیك:** پیتکه، پته، بەسەری قامك لەشت‌دان ف تلنگر.

**پلیکان:** پله‌کانه ف پلکان.

**پلیکه:** پلەی نەردیوان، پلەی پلیکان ف پلّه.

**پن:** ۱) قرنو، جانەوەرێکی چکۆڵەی بانکەڵەی سوره به پێستی ئاژەڵەوه دەنوسێ؛ ۲) پوڵو، سکڵ، پەنگر؛ ۳) نوخته، پەڵەی چکۆڵه؛ ۴) شەق، بەلاق تێهـــەڵـــدان ف ۱) حشـــره‌ای کوچـك که بر پشت حیوان می‌چسبد؛ ۲) اخگر؛ ۳) نقطه؛ ۴) تیپا.

**پنت:** نوخته، پەڵەی گچکه، پن ف نقطه.

**پنتك:** گزموله، کەموکەیەك لەقوڕو... ف اندکی از گِل و...

**پنتی:** ۱) پیس، گەمار، چڵکن؛ ۲) تەمەڵ‌و بێکاره ف ۱) چرکین؛ ۲) تنبل و لَش.

**پنج:** ۱) بنه‌گیا؛ ۲) رەگ‌و ریشه؛ ۳) پینەی قەڵشی دەفری گڵین ف ۱) بوته؛ ۲) ریشه؛ ۳) پینه ظروف سفالین.

**پنجاڕ:** ۱) بنه‌گیا، پنچکه‌گیا؛ ۲) گیای خواردنی نەچێنراو ف ۱) بوته؛ ۲) گیاه خوردنی و پختنی.

**پنج‌لێنان:** گرتنی درزی دەفری گڵین بەپینەی تایبەتی ف مرمت ظرف سفالین.

**پنج‌ومۆر:** شات‌و شوت بەدرۆ: (زۆری **پنج‌ومۆر** لەخۆنا) ف لاف و گزاف.

**پنجه‌دڕو:** بنەدڕك ف خاربُن.

**پنچ:** پینەی درزی دەفری گڵینه ف پینهٔ ظروف سفالین.

**پنچك:** دەوەن، بنەداری پرژو چکۆڵه ف بوتهٔ درختی.

**پنچ کردن:** درزگرتنی دەفری سواڵەتی ف پینه کردن ظرف سفالین.

**پند:** ۱) ئەسپێ مریشك؛ ۲) کونی قون ف ۱) شپش مرغ؛ ۲) مَقْعَد.

**پنـدر:** ۱) کزر، تونـدەوەبوی شل، نیوه وشك؛ ۲) پیرەلۆك، هەڵقرچانی پێستی پەنجـه لەئـاوی گەرم‌و سارد ف ۱) نم خشـك؛ ۲) ترنجیدن پوست از آب گرم و سرد.

**پندرۆ:** کونی پاشەوەی گیاندار، قنگ ف مَقْعَد.

**پنر:** پندر ف نگا: پندر.

**پنژه:** پشمه ف عَطسه.

**پنژین:** پشمین، پژمین، پێکژین ف عطسه‌کردن.

**پنك:** پنت ف نقطه.

**پنکاف:** گوڵاو، ئاوی گوڵ ف گُلاب.

**پنگ:** پونگه، پونگ، گیایەکی خواردنی مرۆڤه، ناعنا ف پونه.

**پنگاو:** سەد، بەربەندی ئاو ف سد.

**پنگر:** ۱) پەرەنگ، پوڵو، سکڵ، پن، پوڵ؛ ۲) پندر ف ۱) اخگر؛ ۲) نگا: پندر.

**پنگرکێش:** ئاسنێکی سەرخواری دەسکداره، سکڵی پێ ڕادەگوێزن ف اخگرکش.

**پنگه:** پنگ ف پونه.

**پنو:** پینه، پنی، پارچەیەك بەسەر دڕاوی‌دا دەدرون ف پینه.

**پنۆ:** پەڵەی چوك، لەکە، خاڵ ف لکّه.

**پنۆك:** پنوُ ف لکّه.

**پنۆك پنۆك:** خاڵخاڵ، پەڵەپەڵە ف دارای لکه‌های زیاد.

**پنـه:** تەختەو دەپێکە ئەنگوتکەنانی لەسەر پان دەکەنەوە ف تخته‌ای که خمیر نان را بر آن پهن کنند.

**پنی:** پینه، پنو ف پینه.

**پنیۆز:** دورکەوتن لەجێ: (پنیۆز بوە: رویوەو دێتەوە) ف رفتن موقّتی.

**پۆ:** ۱) تێوەدانی تەون، هەواڵی رایەڵ؛ ۲) پوُکی ددان؛ ۳) لەزو پەلە؛ ۴) لكو پۆپی دار؛ ۵) رزیوی قوماش: (کوتاڵەکە عەمبارە **پۆیە**: رزیوە)؛ ۶) توانـاو هێز: (لـەپەلو **پۆ** بوُمەوە) ف ۱) پود؛ ۲) لثه؛ ۳) شتاب و عجله؛ ۴) شاخ و برگِ درخت؛ ۵) پوسیده؛ ۶) تاب و توان.

**پوار:** ۱) پاكو خاوێن، پاقژ؛ ۲) کاڵای رزیو، پۆ ف ۱) پاك؛ ۲) پوده.

**پوارتك:** ڕزاوی ناوەرۆکی دارو درەخت ف مغز پودهٔ درخت.

**پواز:** هۆرەی بچـوك، بسنگێکـە لەدرزی داری قەڵشاوی دەنێن تا یەك نەگرێتەوە ف پغاز.

**پوازەناو:** دارێکە وەبەر بەرداشی دەدەن بۆ بڵندکردنی ف پغاز سنگ آسیا.

**پوان:** رزینی کاڵا ف پودن.

**پواو:** رزیو ف پوده.

**پۆبر:** کری زۆر سفتو پڕ ف نسیج سفت تنیده.

**پۆپ:** ۱) پۆپە، قیتکەی سەری مەلو باڵندە؛ ۲) کاکۆڵی سەری مرۆ، پۆر ف ۱) برجستگی سر پرنده؛ ۲) کاکُل.

**پوپڕ:** تاڵان، پوڕ، پویر ف غارت، یغما.

**پۆپرە:** پۆپە، پۆپ ف نگا: پۆپ.

**پۆپکە:** ۱) پۆپەکەڵەشێر؛ ۲) دوندی کێو ف ۱) تاج خروس؛ ۲) قُلّه کوه.

**پۆپڵ:** پۆپە ف برجستگی سر پرنده.

**پۆپن:** مەلی کاکۆڵدار ف مرغ کاکُلی.

**پۆپنە:** ۱) پۆپە؛ ۲) مەلی بە کاکۆڵ؛ ۳) گیای لكو پنج تێکەڵاوی بڵاو ف ۱) برجستگی سر پرنده؛ ۲) مرغ کاکلی؛ ۳) گیاه پُر و درهم شده.

**پۆپنـەکی:** ۱) سەربـەقیتکـە، کاکـۆڵدار؛ ۲) نازنـاوی چوررەیەکـە، چوررەپۆپنەکی ف ۱) مرغ کاکلی؛ ۲) نوعی پرندهٔ کاکلی.

**پۆپۆ:** مەلێکە کاکۆڵدار ف مرغی است کاکلی.

**پۆپە:** قیتکەی سەر، کاکۆڵ، گۆشتی سەری کەڵەشێرو مامر ف تاج مرغ و خروس.

**پۆپەڕەشە:** نەخوشیەکە بەمریشکان وەردەبێ ف نوعی بیماری ماکیان.

**پۆپەژمین:** پێخەفێکی زۆر تەنکە لەخوری ئەیکەن ف شمد پشمی.

**پۆپەکەڵە شێرە:** گوڵێکی سورەلەپۆپە دەکا ف گل تاج خروس.

**پۆپەشمین:** پۆپەژمین ف شمد پشمی.

**پۆپیتە:** پۆپە، قوتکەی سەری مریشكو کەڵە شێر ف تاج خروس.

**پوت:** ۱) بت، خودای دەسکرد، بوت؛ ۲) پورت ف ۱) بُت؛ ۲) کُرك شتر و برهٔ گوسفند.

**پۆت:** ۱) چرچو لۆچ، قرمچی، هەڵقـرچـان؛ ۲) زۆرورد، دەگەڵ خۆل دەگوترێ ف ۱) چین و چروك؛ ۲) بسیار ریز.

**پوُت:** ۱) کورتو لاوازو بێ‌نموت؛ ۲) والا، بەتاڵ، ناوخاڵی؛ ۳) گزرە، گیای گێرەکـراو؛ ۴) کێشێکـە بەرانبەربە شازدە کیلۆ ف ۱) کوتاه و حقیر؛ ۲) میان تهی؛ ۳) گیاه پرس شده؛ ۴) وزنی است برابر شانزده کیلو.

**پۆتراك:** سەروگوێلاك، دیمەنی سەروسەرپۆش ف سروسیما، سرودستار.

**پوُتك:** نەخۆشی خۆرە ف بیماری خوره.

**پۆتلاك:** پۆتراك ف نگا: پۆتراك.

**پۆتە:** زۆرورد، پۆت: (خوەڵەپۆتە) ف بسیار ریز، گَرد.

**پۆتەراك:** پۆتراك ف نگا: پۆتراك.

**پوُتەك:** ۱) زۆر خۆرو چڵێس؛ ۲) بێ‌نموتو کورتو کز ف ۱) شکم باره؛ ۲) لاغر و کوتاه.

**پوُتەکە:** بێ‌نموت، بەرچاونەگر: (کابرایەکی **پوُتەکەی** پیسەکەم دیت) ف بی‌نمود و کوتاه.

**پوُتەگا:** خاڵیگە، کەلەکە، لابرك ف تهیگاه.

**پوُتەڵ:** پوُتەکە ف نگا: پوُتەکە.

**پۆتەلاك:** پۆتراك ف نگا: پۆتراك.

**پۆتەلاگ:** پۆتراك ف نگا: پۆتراك.

**پۆتی:** رەجاڵە، لات: (لۆتیو **پۆتی**) ف لات و اوباش.

**پۆتێ:** پۆتە ف نگا: پۆتە.

**پوتیتە:** ۱) پەتاتە؛ ۲) پۆتە ف ۱) سیب‌زمینی؛ ۲) بسیار ریز.

**پۆتین:** ۱) کەوشی لاسـك درێژی کەمتـر لەچـەکمـە؛ ۲) زۆرورد: (**خوڵەپۆتین**) ف ۱) پوتین؛ ۲) خاك بسیار نرم و ریز.

**پوچ:** ۱) بێ‌ناوك، بێ کاکڵ؛ ۲) قسەی بێ‌ماناو خەیاڵی ف ۱) میان‌تهی؛ ۲) یاوه.

**پوُچەك:** دانەوێڵەی بێ کاکڵ ف بُنشن میان‌تهی.

**پوُچەڵ:** ۱) پوُچەك؛ ۲) بێ‌نرخو بێ‌برەو ف ۱) بُنشن میان‌تهی؛ ۲) بی‌ارزش.

**پۆخ:** ۱) خونچەی کولۆکی‌دار؛ ۲) میوەی زۆرگەیشتوی پلیخاو؛ ۳) بنو ریشەی برین ف ۱) غنچه شکوفه؛ ۲) میوهٔ له‌شده؛ ۳) ریشه ناسور.

**پوخت:** ۱) پاكو تەکـوز: (کـاری زۆر **پوختن**)؛ ۲) لێنـانی شێو ف ۱) مرتب؛ ۲) پخت و پز.

**پوختکردن:** رێك‌خستن‌و جێ‌بەجێ کردن ف ترتیب دادن.

**پوختوپەز:** شێو لێ‌نان ف پخت‌وپز.

**پوختە:** هەڵبژاردە، بژاردەی قسە، خولاسە ف خُلاصه.

**پۆخك:** گوڵینگەی کلاو ف منگولهٔ کلاه نمدی.

**پۆخڵ:** چڵکن: (پیسو **پۆخڵ**) ف چرکین و کثیف.

**پۆخڵە:** بنی برین، ریشەی برین ف ریشهٔ ناسور.

**پۆخڵەوات:** ۱) کاری پیسو بێ کەڵـك؛ ۲) خرتوپرتی بێ‌نرخ ف ۱) کار کثیف و بی‌ارزش؛ ۲) اثاثیهٔ بُنجل.

**پۆخە:** خونچەی گلۆکی دار، پۆخ ف اوّلین شکوفهٔ درخت.

**پوخین:** ۱) قاوتی گەنم؛ ۲) چێشتی بۆدراو؛ ۳) جیژنێکی یەزیدیانە ف ۱) قاوت گندم؛ ۲) آش قاوت؛ ۳) از اعیاد یزیدیها.

**پود:** کرون، ژەنـگ لێدراوی زبـر و کون‌کون بوگ ف زنـگ‌زدهٔ زبر و سوراخ سوراخ شده.

**پوداى:** پێوەدان، مارپێوەدان ف نیش زدن.

**پودو:** پوك، گۆشتی ددان ف لثه.

**پوڕ:** ۱) موی سەر؛ ۲) باڵنـدەیەکی خوش گۆشتەو لەمریشك زلترە؛ ۳) بەرین، هەراو، گوشاد: (پان و پوڕ)؛ ۴) ڕێك و جوڕ ف ۱) موی سر؛ ۲) دراج؛ ۳) عریض؛ ۴) مُنظّم.

**پوڕ:** زۆر، زاف ف زیاد، بسیار.

**پوڕ:** ۱) تالان؛ ۲) ئاخنین ف ۱) غارت؛ ۲) انباشتن.

**پوڕ:** ۱) خوشکی باوك؛ ۲) خوشکی دایك ف ۱) عمّه؛ ۲) خاله.

**پوڕاندن:** بەزۆر ئاخنین ف سپوختن.

**پورت:** پەڕوباڵ ف پروبال.

**پورت:** لوا، بەرگن، توکی وشتر و بەرخ ف کُرك شتر و برّهٔ گوسفند.

**پورت:** پرتك، پرتوك ف جُزءِ کوچك.

**پورتخه:** بنی برین، ریشەی کوان ف ریشهٔ ناسور.

**پورتك:** ۱) سەرپوش، مو داپوش؛ ۲) رزیو ف ۱) سرپوش؛ ۲) پوده.

**پورتکان:** رزین، پوان ف پودن.

**پورتکاو:** رزاو، پواو ف پوسیده.

**پورخز:** ۱) جەموش، توڕ؛ ۲) خوێڕی و بێکارەو نەگونجاو ف ۱) رموك؛ ۲) ناهنجار.

**پورزا:** فرزەندی پوڕ ف عمّەزاده، خالەزاده.

**پورزازا:** نەوەی پوڕ ف نوهٔ عمّه یا خاله.

**پورکه:** پوڕ ف عمّه.

**پوڕگ:** ۱) زیپکەی هەڵتوقیوی پرئاو؛ ۲) پینەی دەست؛ ۳) نێرتکی ناو دومـەڵ؛ ۴) تیکـوڵی چەڵتـوك؛ ۵) ناوگوڕکی رەشمـاڵ؛ ۶) باری چیغ‌وچادر ف ۱) تاول؛ ۲) پینهٔ دست؛ ۳) غدهٔ داخل دُمل؛ ۴) پوست برنج؛ ۵) آتشدان سیاه‌چادر؛ ۶) کیسه چادر.

**پوره:** شلخه مێش هەنگوین ف نسل نوین زنبور عسل.

**پوره:** پیا، پێدا ف برآن.

**پورەدان:** شڵخەدانی هەنگ ف بیرون آمدن نسل نوین زنبور از کندو.

**پوڕیان:** ڕێك‌وپێك بون، جوڕ بون ف جوردرآمدن.

**پوز:** بەلەك، لەتەر، نێوان قولەقاپەو ئەژنو ف ساق.

**پوز:** ۱) کەپو؛ ۲) دەم‌و لەوس؛ ۳) زەنبورەی ئاش؛ ۴) کونی قنگ ف ۱) بینی؛ ۲) نس؛ ۳) سوراخ تنگ ناو آسیا؛ ۴) مَقْعَد.

**پوزکه:** زەنبورەی ئاش ف سوراخ تنگِ ناوآسیا.

**پوزنکان:** پوان، رزین ف پودن.

**پوزه:** دەم‌ولوتی حەیوان ف پوزهٔ حیوان.

**پوزه بەن:** زاربێنی بێچوی شیرخوری ئاژەڵ ف پوزەبند بچه حیوان.

**پوزەخوگه:** بەرێکی داری مازو ف نوعی ثمر مازوج.

**پوزەوان:** بەلەك پێچ ف ساق پیچ.

**پوزەوانه:** پوزەوانه ف نگا: پوزەوانه.

**پوزەوانـه:** ۱) ئاڵقـەی لوتی حەیوان؛ ۲) بەلەك پێچ، ساق بەند ف ۱) حلقهٔ سوراخ بینی حیوان؛ ۲) ساق‌پیچ.

**پوژمور:** سیس، چرچ هەڵگەڕاو ف پژمرده.

**پوس:** ۱) پێست؛ ۲) بێمو، رواڵ: (لوس و پوس) ف ۱) پوست؛ ۲) سادهٔ بیمو.

**پوس:** ۱) پوس؛ ۲) مەخفـەر، جێگـەی پاسـەوانان؛ ۳) تەتەر، جێگەی نامـەگەیانـدن؛ ۴) کەوڵی تیسکن؛ ۵) رزیو ف ۱) پوست؛ ۲) پست نگهبانی؛ ۳) پستخانه؛ ۴) پوستین؛ ۵) پوسیده.

**پوست:** ۱) کەوڵ؛ ۲) نامەگەیێن؛ ۳) پوسەخانه؛ ۴) بنکەی پاسەوانان؛ ۵) پێستی لەش ف ۱) پوستین؛ ۲) پستچی؛ ۳) پُستخانه؛ ۴) پست نگهبانی؛ ۵) پوست.

**پوستخانه:** دەزگای نامەگەیاندن ف پُستخانه.

**پوست کردن:** نامە بەئیدارەی نامەگەیاندن دان ف نامه پُست کردن.

**پوست کەندن:** کەوڵ کردن، پێست لێ کردنەوە ف پوست کندن.

**پوست کەنن:** پوست کەندن ف پوست کندن.

**پوستگاڵ:** بن‌دوگی مەڕ ف زیر دنبهٔ گوسفند.

**پوستگرتنەوە:** کەوڵ‌کردن، پوست کەندن ف پوست کندن.

**پوستنشین:** برێتی لەشێخی تەریقەت ف کنایه از مرشد طریقت.

**پوسته:** دەزگای نامەگوێزانەوە ف پُستخانه.

**پوستەچی:** نامەبەر ف نامەرسان.

**پوستەخانه:** پوستخانه ف پُستخانه.

**پوستین:** کەوڵی تیسکن ف پوستین.

**پوسك:** زەنبورەی ئاش، کونی خواروی دوڵاش ف سوراخ ناو آسیا.

**پوسکەندن:** کەوڵ کردن، پوستکەندن ف پوست کندن.

**پوسکەنده:** ۱) توێکڵ لێ فرێدراو؛ ۲) قسەی بێ‌خواروپێچ‌و ئاشکرا ف ۱) پوست‌کنده؛ ۲) حرف رُك.

**پوسه:** تێکوڵی ناسکی هێلکەو هەرچی ف پوستهٔ نازك.

**پوسەخانه:** پوستخانه ف پُستخانه.

**پوسیان:** رزان، رزین ف پوسیدن.

**پوسین:** ۱) رزین؛ ۲) کەوڵی تیسکن، پوستین ف ۱) پوسیدن؛ ۲) پوستین.

**پوش:** ۱) پاشگـری بەواتـا دەبـەرکـەر: (چـەکمەپوش)؛ ۲) پاشگری وەشـاردنەوە: (عەیب پوش)؛ ۳) بزنی سپی گوێ رەش ف ۱) پسوند بەمعنی‌پوشیده؛ ۲) پسوندبەمعنی‌پنهان‌کننده؛ ۳) بُزسفیدسیاه‌گوش.

**پوش:** وشکەگیای دەشت ف گیاه خشك بیابانی.

**پوشاك:** جلك‌و بەرگ ف پوشاك.

**پوشاڵ:** ریشو، پرزەی قەراغی قوماش ف منگوله، پُرز.

**پوشان:** دەبەرکردن، لخوکردن ف پوشیدن، بەتن کردن.

**پوشانه:** سەرانەی ئاژەڵ بو ئاغا، باجی لەوەڕ ف حقّ المرتع.

**پوش بەقونـه:** جانەوەرێکـی چواربالّی قون درێـژه، زەل‌بەقونـه ف سَنجاقك.

**پوش بەقنگه:** پوش بەقونه ف سنجاقك.

**پوشپار:** وشکەگیا ف خُشك گیاه.

**پوشپەڕ:** ١) جەنگەی گیادرون؛ ٢) سێهەمین مانگی بەهار ف ١) موسم درو گیاه؛ ٢) خرداد ماه.

**پوشت:** نێری حیز، پیاوی گاندەر ف اُبنه.

**پۆشتـە:** ١) بەرگ تازەو باش؛ ٢) برێتی لەسـازو بەکەیف ف ١) شیك لباس؛ ٢) شاد و سرحال.

**پۆشتـەکـردنەوە:** ١) بەرگی کۆن بەتازە گۆڕینەوە؛ ٢) برێتی لە سازو بێ‌نیازکردنی کەسێك ف ١) لباس تازە پوشانیدن؛ ٢) کنایە از بی‌نیاز ساختن کسی.

**پۆشتەو پەرداخ:** رێك و پێك و تەیارو ساز ف مُرتَّب و شیك.

**پوشدانەدەست:** زەرەر پێ‌گەیاندن ف کنایە از زیان رسانیدن.

**پوشکە:** چیلکە، داروکەی سوتەنی ف هیمە، تکەچوب کوتاه.

**پوشڵە:** چیلکـەی سەربـەلـوکە، بۆ عیماڵەی مناڵ بەکاردێ ف شیاف چو بی بچّه.

**پوشو:** هەرچی زو ئاگر بگرێ، *دەگەڵ ئەستیو بەرد دەکاردێ* ف هود، برهود.

**پوشو پەلاش:** گیای بابردەڵەی وشك ف خس و خاشاك.

**پۆشـە:** ١) پشیلە؛ ٢) بزنی پۆش: (هـەم بو، نەم بو، چەنـد قۆشە / دام بەبزنێکی **پۆشە**) «بەردەشانی» ف ١) گربە؛ ٢) بُز سفید سیاه‌گوش.

**پوشەڵان:** جێگەی وشکەگیای زۆر ف جای خشك پُرگیاه.

**پۆشەن:** پۆشاك ف پوشیدنی.

**پۆشەنی:** شیاوی دەبەرکردن ف پوشاك.

**پۆشی:** ١) روبەندی ژنان؛ ٢) پوشو ف ١) روبند؛ ٢) هود.

**پۆشی بەرڕۆژ:** برێتی لەپیاوی سوك و بێ‌نرخ ف کنایە از مرد سبك و بی‌ارزش.

**پۆشین:** ١) دروست کراو لەلاسکە دەغڵ و گیا: (سەلەی **پۆشین**، کڵاوی **پۆشین**)؛ ٢) سەرپێچی رەشی ژنـــان؛ ٣) خشڵی سـەری ژنـــــە، پێشەسەر ف ١) ساختەشدە از ساقۀ غلّە؛ ٢) سر پوش سیاه زنانە؛ ٣) زیور سر.

**پۆشین:** ١) دەبەرکردن؛ ٢) وەشاردن، پۆشان ف ١) پوشیدن؛ ٢) پنهان کردن.

**پۆشینپێچ:** خشڵی سەر سەرپێچ ف زیوَر سر.

**پۆشینە:** زەنبیلە، تریانی لەپوش کراو ف سَبَد کوچك.

**لۆغە:** پانێری نەخەساو ف گوسالۀ دوسالۀ اختەنشدە.

**پوف:** ١) سی، جەرگی سپی؛ ٢) فوی بەهێز؛ ٣) وشەی نارەحەتی لەبۆنی ناخۆش ف ١) ریە، شُش؛ ٢) پُف؛ ٣) کلمۀ تنفّر از بوی بد.

**پوفلك:** پزدانی فودان کەمناڵ نەیکەن، تیزانگ ف بادکُنك.

**پوقژە:** وردەزیپکەی پێست کەئاوی تیابێ، پۆرگ ف تاول ریز.

**پوك:** ١) پدو؛ ٢) بن‌پێست: (**پوك و پێست**)؛ ٣) بەتاڵ و ناوخاڵی، پوچ؛ ٤) چەپۆك، بەپانی دەست لەسەر دان؛ ٥) لاوازی، کەم‌کردن؛ ٦) کرێوە، بەفر بـەبـاوە ف ١) لثە؛ ٢) زیر پوست؛ ٣) تُهی؛ ٤) توسری؛ ٥) لاغرشدن؛ ٦) کولاك.

**پۆك:** وشەی سەیرمان: (**پۆك!** چەند سەیرە) ف کلمۀ تعجُب.

**پوکانەوە:** پوچانەوە، کەم‌کردن و چرچ هەڵگەڕان ف اُفول.

**پوکاو:** ١) رزیو. *بۆداری دەڵێن*؛ ٢) چرچ ف ١) درختِ فرسودە؛ ٢) چروك.

**پوکـاوڵ:** چەمۆڵە، چەمبۆڵە ف صوت و حرف تَنفُر کە با بازکردن پنجه بطرف کسی گفته می‌شود.

**پوکاوڵە:** پوکاوڵ ف نگا: پوکاوڵ.

**پوك و پێست:** بەتاڵای نێوان گۆشت و پێست ف بین گوشت و پوست.

**پوکە:** ١) گریان بەدەنگی نزم؛ ٢) بەری قامیش کەوەك لۆکە دەچێ ف ١) گریۀ یواشکی؛ ٢) تمر نی کە مثل پنبە می‌ماند.

**پوکەپوك:** گریانی بەدەنگی نزم، نوکەنوك ف آرام گریستن.

**پۆکەر:** جۆرێ قوماری بەپەڕانە ف نوعی قمار گَنجفە.

**پوگ:** رەشەبای زۆر توند ف باد سخت.

**پۆل:** ١) سکـڵ، پەنگـر، پەن، پۆلـو؛ ٢) کۆمـەڵێك باڵندە؛ ٣) وەتاغی دەرس، سەف، کلاس ف ١) اخگر؛ ٢) گروە پرندە؛ ٣) کلاس درس.

**پوڵ:** کەمتـرین نەغد، وردە، قۆشە: (بە**پوڵێ** نامەوێ دەرمان لەنەشئەی چاویە عیللەت) «نالی» ف پَشیز.

**پوڵ:** پارە، نەغد ف پول.

**پۆلا:** جۆرێ ئاسنی رەق‌تر ف فولاد.

**پۆلاخۆر:** برێتی لەپیاوی ئازاو گوێ نەدەر بەخەتەر ف پولادخا، کنایە از شجاع.

**پۆلاد:** پۆلا ف فولاد.

**پۆلان:** مانگی رەشەمە، سێهەم مانگی زستان ف ماه اسفند.

**پۆلانیا:** دەمەزەردی گاسن ف تیزکردن گاوآهن.

**پۆلایین:** لەپۆلا چێ‌کری ف پولادین.

**پوڵپەرست:** رژدو چنۆك، رەزیل ف پول‌پرست.

**پوڵدار:** دەوڵەمەن، خاوەن سامان ف پولدار.

**پۆلك:** پوڵەکە ماسی ف فلس ماهی.

**پوڵك:** بریقە، ئۆییە ف پولك زینتی.

**پوڵکە:** پوڵك ف پولك زینتی.

**پۆلکە:** گاگوز ف خِلَر.

**پۆلکە:** پۆرگ، پینەی دەست، بلۆقی پێست ف تاول، پینۀ دست.

**پۆلو:** پۆل، سکڵ ف اَخگر.

**پوڵەزەرتکـە:** پوڵی چکۆڵەی زەرد کە دەکرێتە خشڵی ژنان ف پولك بُرنزی.

**پوڵـەکە:** ١) پەڕەوردەکانی پشتی ماسی؛ ٢) پترۆخە، قرتماغەی برین؛ ٣) ئۆییە، بریقە ف ١) فلس ماهی؛ ٢) کبرۀ زخم؛ ٣) پولك زینتی.

**پوڵەکە:** پولەکە ف نگا: پولەکە.

**پوڵەکەرێز:** بەرگێ کە ئۆییەو بریقەی پێدا دورابێ ف لباس پولکدار.

**پوڵەکی:** رژدو چروك، دەسقوچاو ف پول‌پرست.

**پوڵەکی:** پولەکی ف نگا: پولەکی.

**پۆلی:** سکڵ، پەنگر، پۆلو ف اَخگر.

**پۆلیس:** شورتە، داروٚغە، گزیری دەوڵەت ف پلیس.

**پوٚن:** خوێنی ژن، حەیز ف حیض، قاعدەشدن زن.

**پونژین:** خەوبردنەوە، وێژنگدان ف پینکی.

**پونگ:** پنگ ف پونە.

**پونگال:** ناوەند، ناوەڕاست ف وسط.

**پونگاو:** گەڕانەوی ئاوی داوەستاو ف نگا: پەنگاو.

**پۆنی:** ژن لەحەیزدا ف زنی کە در قاعدگی باشد.

**پوە:** بەری قامیش کەوەك لۆکە دەچێ ف ثمر نی کە مثل پنبە می‌ماند.

**پۆی:** رزین، پۆ ف پودن.

**پۆیاگ:** رزیو ف پودە.

**پۆیان:** رزان، دارزان ف پودن.

**پویت:** بەرگن. لوا. موی وشتر و بەرخ و کەروێشك ف کُرك شتر و خرگوش و امثالهم.

**پوێز:** پوڕ، تالاّن ف غارت، چپاول.

**پویشك:** ۱) بەلم، کای هەرزن و چەلتوك؛ ۲) چەڵتوك ف ۱) کاه شالی و ارزن؛ ۲) شالی.

**پویل:** پوڵ ف پول.

**پۆیلانە:** دیاری بۆتازەزاوا یا تازەبوك ف کادو برای داماد و عروس.

**پۆیلە:** ۱) پۆیلانە؛ ۲) لیزگەموروی سەر بۆخشڵ لەسەری دەدەن ف ۱) کادو برای عروس و داماد؛ ۲) رشته و مهره‌های زینتی.

**پەپك:** پاچە، پاچك، لاق و دەست لەسەرو پێدا ف پاچه.

**پەپکە:** ۱) جورێ کولێرە نان؛ ۲) خۆیانی خەرمان؛ ۳) نانەحاجی لەك لەك؛ ۴) ئەنگوتکی هەویر؛ ۵) پاپۆکە: (مارپەپکەی دابو) ف ۱) نوعی گرده نان؛ ۲) خرمن نکوبیده؛ ۳) پنیرك؛ ۴) چونه؛ ۵) چنبره.

**پەپکەبەستن:** پاپۆکەدان ف چنبرەزدن.

**پەپکەخواردن:** پەپکەبەستن ف چنبرەزدن.

**پەپکەدان:** پەپکەبەستن ف چنبرەزدن.

**پەپکەمەلیچکانە:** نانەحاجی لەك لەك، توڵەکە، توڵك تۆڕکە، نان‌حاجی لەق لەق ف پنیرك.

**پەپو:** ۱) حەیف، مخابن؛ ۲) پەپو: باڵدارێکی سەربەکلاوی بەناوبانگە؛ ۳) کوندەبومە، باڵدارێکی شومە: (واوێران بوە **پەپوی** لێ دەخوێنێ) ف ۱) کلمۀ تأسّف؛ ۲) هدهد؛ ۳) بوف.

**پەپۆ:** دەنکی میوە ف دانۀ میوە.

**پەپۆك:** ۱) کڵۆڵ و بێچارە؛ ۲) کوندەبو ف ۱) بیچارە؛ ۲) بوف.

**پەپوٗك:** ژارو بێچارە، بەستەزوان ف بیچارە.

**پەپۆکە:** کولێرەی چکۆڵە ف گردە نان کوچك.

**پەپۆڵە:** ئەنگوتکەنانی چکۆڵە ف چونۀ کوچك.

**پەپوسلێمانکە:** پەپوسلێمانە ف هُدهُد.

**پەپوسلێمانە:** پەپوسلێمانکە ف هُدهُد.

**پەپوسلێمانی:** پەپوسێمانە ف هُدهُد.

**پەپوسێمانە:** پەپوسلێمانی، شانەبەسەر ف هُدهُد.

**پەپوقژە:** باڵدارێکە وەك پەپوسلێمانە بەلاّم بێ کاکۆڵ ف پرنده ایست شبیه هُدهُد.

**پەپوکەرە:** کوندەبو ف جُغد.

**پەپولە:** نمنموٚك، پەروانە ف پروانه.

**پەپولەپایزە:** پشیلەپایزە ف قاصدك.

**پەپولەهەڵهێنان:** جۆرێ نەخۆشی ئاژەڵ ف نوعی بیماری دام.

**پەپولەهەلێنان:** پەپولەهەڵهێنان ف نوعی بیماری دام.

**پەپوٗیك:** ۱) کوند؛ ۲) بەستەزمان و بێچارە ف ۱) جغد، ۲) بیچارە و بی نوا.

**پەپە:** ۱) کولێرەی چکۆڵە؛ ۲) زەردێنەی هێلکەی پانەکراوەوەی سورەوەکراو ف ۱) گردە نان کوچك؛ ۲) خوراکی از زردۀ تخم‌مرغ.

**پەت:** ۱) گوریس، لەتەگوریس؛ ۲) پارچە: (لەت‌وپەت) ف ۱) رسن؛ ۲) تکّه، پاره.

**پەتا:** ۱) نەخۆشی گیرۆ، تاهۆ، ئازار، درم؛ ۲) پەسیو، هەلاّمەت، ئالاّمەت؛ ۳) نیوەنمەك و شەڵتەی گەرمی سەربرین ف ۱) واگیر؛ ۲) زکام؛ ۳) ضِماد گرم که بر زخم نهند.

**پەتاتە:** سێف‌زەمینی، یارەڵماسی ف سیب‌زمینی.

**پەتانی:** پوٚتە، خوٚڵی زۆر ورد ف خاك نرم.

**پەتانێ:** پوٚتە: (خوٚڵە **پەتانێ**) ف بسیار ریز.

**پەتبازی:** تەنافبازی، بەسەر پەتێ‌ڕا هەنگیو راودا روٚیشتن، پاڵەوان‌بازی ف بندبازی.

**پەتپەتی:** ۱) نیوەنمەك؛ ۲) برێتی لە ئازارو تەفرەدان ف ۱) ضِماد خمیر؛ ۲) کنایه از بمبول درآوردن.

**پەتپەتی پێکردن:** دەستاودەست پێکردن، تەفرەدان، حەواڵە بەگەواڵە ف بەسر دواندن.

**پەتپەتێن:** سوکایەتی بەسەرهێنان و ئازاردان ف اهانت کردن و آزار دادن.

**پەترمە:** ۱) موتوربە، پەیوەندی درەخت؛ ۲) کوتان بوٚ ئاوڵە ف ۱) پیوند درخت؛ ۲) مایه‌کوبی.

**پەترۆ:** قرتماغە، بەڕەی ئاسکی سەربرین، توێ ف کبرۀ زخم.

**پەترۆخە:** پەترۆ ف نگا: پەترۆ.

**پەترۆك:** ۱) پەرتوك، پاژی زۆر بچوك: (**پەترۆکە** نانێکی بەکەس نەدەدا)؛ ۲) پەترۆ ف ۱) قطعۀ کوچك؛ ۲) کَبره زخم.

**پەترۆکە:** پەترۆ ف نگا: پەترۆ.

**پەتك:** ۱) لەتەگوریس؛ ۲) تلپی قەزوانی رۆن لێ گیراو ف ۱) رسن؛ ۲) دردی ئانکش روغن گرفته.

**پەتکردن:** ۱) گوریس دەمل خستن؛ ۲) برێتی لەهێنان و ڕاکێشانی بەسوکایەتی ف ۱) رسن به گردن انداختن؛ ۲) کنایه از آوردن و کشیدن با توهین.

**پەتڵە:** ۱) ساوار، ساوەر؛ ۲) دانەوێڵە ف ۱) بلغور؛ ۲) بنشن.

**پەتۆ:** هەناسە، نەفەس ف دم، نفس.

**پەتو:** بەتانی، بەتانیە، ئەدیاڵ ف پتو.

**پەتە:** ۱) پسولە، جەواز، بلێت؛ ۲) پێژانی نان ف ۱) بلیط؛ ۲) پختن نان.

**پەتەر:** بەلاّ، پەتا ف مُصیبت.

**پەتەری:** شێتۆکە، ئاقڵ سوك ف خُل و پتیاره.

**پەتی:** ١) روت، خواس: (پـا پەتی)؛ ٢) خالیس، ناتێکـەڵاو: (ئـاوێکە پەتی) ف ١) برهنه؛ ٢) خالص، ناب.

**پەتیارە:** پەتەری، گەلالایی ف خُل و پَتیاره.

**پەچ:** ١) پێچ، پەرچ؛ ٢) دلۆپێك لەبنیشت ف پَرچ؛ ٢) تکهٔ سقز.

**پەچدان:** خوارکردنەوەو پێچدانی بزمارو... ف پرچ دادن.

**پەچدانەوە:** پەچدان ف پرچ‌دادن.

**پەچك:** بەچك، بیچم ف سیما و قیافه.

**پەچن:** پڕی سەرڕێژ: (وام پڕکردوە قەلا پەچن) ف انباشته.

**پەچنین:** پڕکردنی‌وا کەجێگەی چی‌تر نەبێتەوە ف لبریز کردن.

**پەچـە:** ١) روبەنـدی ژنـان؛ ٢) پێژانی نان؛ ٣) جێ‌خەوی مێگـەل لەدەشت، حەوشە ف ١) روبنده؛ ٢) پختن نان؛ ٣) آسایشگاهِ گلّه در دشت.

**پەچەتە:** پارچەی سەرکۆش لەدەمی خواردندا ف پیش‌بندِ غذاخوری.

**پەچەڵ:** چەپەڵ، گەمار، پیس، پۆخل ف کثیف، چرکین.

**پەح:** وشەی سەیرمان ف کلمهٔ تعجُب.

**پەحا:** پەح ف نگا: پەح.

**پەحـا:** وشـەی سەیرمان بەباوڕ نەکردنەوە: (**پەحا لەم درۆیەت!**) ف کلمهٔ تعجب و انکار.

**پەحتن:** پێژانی نان ف پختن نان.

**پەحلەوان:** تەنافباز، پاڵەوان ف بندباز.

**پەحن:** پان، بەرین ف عریض.

**پەحنی:** پاژنە، پانیە ف پاشنه.

**پەخ:** ١) سواوی کول: (خـەنجـەراتـە **پەخ** بویە)؛ ٢) وشـەی پەسنـد لەزمانی منالاّندا ف ١) تیغ کند؛ ٢) بەبە بچّگانه.

**پەخ‌بون:** سوان‌و کول‌بونی تیغ ف کُندشدن تیغ.

**پەخخە:** زۆرجوانە، لەزمانی منالاّندا ف بەبە بچّگانه.

**پەخش:** بلاّو، پرژاو ف بخش.

**پەخشان:** ١) پەخش، بلاّو؛ ٢) نوسراوی بەرانبەری هۆنراو، نەسر ف ١) پراکنده؛ ٢) نثر، مقابل نظم.

**پەخشان‌بون:** بلاّوبون، پرژان ف پریشان شدن.

**پەخشانکردن:** بلاّوکردن، پرژاندن ف پراکندن.

**پەخشان کردنەوە:** بلاّوکردنەوە، دابەش دابەش کردن ف توزیع.

**پەخشە:** ١) بلاڤۆك، ئینتیشارات؛ ٢) مێشولە، پێشی ف ١) نشریه؛ ٢) پشه.

**پەخشەکوڕە:** جۆرێ مێشولە ف نوعی پشّه.

**پەخمە:** گێل، بێ‌ئاوەز ف پَخمه.

**پەخۆ:** هەربۆخۆ ف خودِ شخص.

**پەخوا:** پێخوێ، کلۆشی بەرپێی گاگێرە ف خرمن در حال کوبیدن.

**پەخین:** لەقە، پێلاقە ف لگد.

**پەڕ:** ١) توکی باڵی مەل؛ ٢) مەڕی سپی سەروگەردن رەش؛ ٣) قەراخ، کەنار؛ ٤) وەرەقە قاقەز؛ ٥) ئاخر، دوماهی؛ ٦) لێدراو: (باپەڕ بوە)؛ ٧) دور: (پـەڕ بوە)؛ ٨) فڕین؛ ٩) پەڕین: (هـەڵ پەڕە) ف ١) پر؛ ٢) گوسفنـد سفید گردن سیاه؛ ٣) کنـار؛ ٤) ورق کاغذ؛ ٥) پسین؛ ٦) زده‌شده؛ ٧) دور؛ ٨) پروازکردن؛ ٩) پریدن.

**پەڕ:** مەڕی سەروگەردن رەش ف گوسفند سفید سر و گردن سیاه.

**پەڕانپەڕ:** دەوراندەور، کەنارەوکەنار ف پیرامون.

**پەڕاسـو:** ١) پەراسی، ئێسکی کەوانـەیی لەپشتدا؛ ٢) تەنشت؛ ٣) قامیشی رایەڵی چیغ‌و خانوی لەقامیش ف ١) دنده؛ ٢) تهیگاه؛ ٣) تارهای نی در بافتنی از نی.

**پەڕاسوبەند:** دەفەی سنگ ف استخوان سینه.

**پەڕاسوە:** قامیشی رایەڵی چیغ‌و... ف تارِ نی در چیغ.

**پەڕاسی:** ئێسکی کەوانی لەپشتدا، پەراسو ف دَنده.

**پەڕاگەندە:** ئاوەکی،حەیوانی لەمێگەل‌دورکەوتو ف حیوان ازگله‌دورافتاده.

**پەڕان:** ١) سواربـونی نێر لەمێ؛ ٢) لەت لێ‌بونـەوە: (دەمی چەقوەکە **پەڕیوە**)؛ ٣) پەرت‌بون: (دارەکە لەدەستم **پەڕی**) ف ١) گُشنی؛ ٢) تکّه‌ای از چیزی پریدن؛ ٣) پرت شدن.

**پەڕانـدن:** ١) سوارکردنی نێر لەمێوینە؛ ٢) لەت لێ فڕێدان: (ئەم لکە **بپەڕێنە**)؛ ٣) بەجێ هێشتن: (لە خوێندنەوەدا خەتێکت **پەڕاند**)؛ ٤) لەپێش لابـردنی کۆسپ: (لـەمپـەرم **پەڕانـد**)؛ ٥) بەدوای پێشگری «هـەڵ»دا بەمـانای رەقساندنە: (**هەڵپەڕاندن**)؛ ٦) بەدوای پێشگری «ڕا»دا بەمـانای بێدار کردنەوەیە: (**ڕاپەڕاندن**)؛ ٧) لەدوای پێشگری «دا» بەمانای ڕەتاندنە: (دام **پەڕاندە** خوار)؛ ٨) لەپاش «لێ» بەمانای نەهێشتن: (**خەو لێ پەڕاندن**) ف ١) جُفت کردن نر بر ماده؛ ٢) چزئی از کل را قطع کردن؛ ٣) بجـای گذاشتن؛ ٤) برداشتن مانـع؛ ٥) رقصاندن؛ ٦) بیدارکردن؛ ٧) تکان دادن؛ ٨) نگذاشتن.

**پەڕانـدنـەوە:** ١) لەئـاو دەربازکردن؛ ٢) بریتی لە لەبەلاّ رزگار کردن: (**پەڕاندوتمەوە**) ف ١) عبور دادن؛ ٢) نجات دادن.

**پەڕانن:** پەڕاندن ف نگا: پەڕاندن.

**پەڕاننەوە:** پەڕاندنەوە ف نگا: پەڕاندنەوە.

**پەڕانەوە:** پەڕینەوە، لەئاو دەربازبون ف عبورکردن.

**پەراو:** کەناراو ف مستراح.

**پەڕاو:** دەفتەر، کتێب، دەفتەری پەرە سیغار ف کتاب، دفتر، کاغذ سیگار.

**پەڕاوی:** پەڕاو ف نگا: پەڕاو.

**پەڕاوێز:** ١) کەنارەی جلك؛ ٢) حاشیەی کتێب ف ١) حاشیهٔ لباس؛ ٢) حاشیهٔ کتاب.

**پەراوێزی عاسمان:** ئاسۆ ف افق.

**پەڕبازی:** باڵەفڕەی جوچکی مەل بۆ فێربونی فڕین ف پرپرزدنِ جوجه برای پرواز.

**پەڕبون:** دورکەوتنەوە، بەسەهوچون ف دورشدن، اشتباه کردن.

**پەڕپتین:** بلاّوبون، لەبەریەك چون ف ازهم در رفتن.

**پەڕپوت:** ١) لەبەریەك هەڵوەشاو؛ ٢) جۆرێ مراوی ف ١) ازهم در رفته؛ ٢) نوعی مرغابی.

**پەڕپەرك:** ١) پەپولە؛ ٢) گوڵی لیلوپەڕ ف ١) پروانه؛ ٢) نیلوفر.

**پەڕپەڕۆك:** پەپولە ف پروانه.

**پەڕپینە:** پەڵپینە، پر پره ف گیاه خرفه.
**پەرت:** ١) سەهوکار؛ ٢) هەڵدێراو ف ١) اشتباه کار؛ ٢) واژگون.
**پەڕتاندن:** لەبەریەك هەڵپچڕاندن ف پاره‌پاره کردن.
**پەرتاوتن:** لك هەڵپاچینی دار ف هَرَس کردن.
**پەڕتوك:** کتێب ف کتاب.
**پەڕتەوازە:** پەڕەوازە، ئاوارە ف آواره، ویلان.
**پەڕتین:** پەڕتان، تێكو پێكچون‌و پچڕپچڕبون ف ازهم در رفتن و پاره‌پاره‌شدن.
**پەرجو:** موٚجزات ف مُعجزه.
**پەرج:** پێچدانەوەی ئاسن‌و بزمارو...؛ ٢) پەرژین، چیل؛ ٣) سەرلکی هەڵپەرتاوتە؛ ٤) مێشەو لێڕی چوغور ف ١) پَرچ؛ ٢) پرچین؛ ٣) شاخهٔ پیراسته‌شده؛ ٤) بیشهٔ انبوه.
**پەرچان:** خوارکردنەوەی بزمارو... ف خواباندن میخ و...
**پەرچانن:** پەرچان ف نگا: پەرچان.
**پەرچاوە:** خوارەوەبو ف پرچداده شده.
**پەرچدانەوە:** خوارکردنەوەو خەواندنی بزمارو...؛ ٢) پێشەبڕە بڕینەوە لەرێگە؛ ٣) بەدەم داهاتنەوە ف ١) پرچدادن؛ ٢) در راه از کسی پیشی گرفتن؛ ٣) جواب سخت دادن.
**پەرچڤ:** ماسین، ئەستوری ف ورم، آماس.
**پەرچڤین:** ئەستوربون، ماسین ف آماسیدن.
**پەرچق:** وردە، لەت ف اندك، ریزه.
**پەرچقان:** وردو خاش‌بون، لەت‌و کوت‌بون ف ریزریز و پاره‌شدن.
**پەرچقاندن:** وردولەت کردن ف تکه‌تکه کردن.
**پەرچقین:** پەرچقان ف نگا: پەرچقان.
**پەرچوکە:** موی لەسەر هەنیە قرتاو ف موی زینتی بر پیشانی.
**پەرچە:** ١) پارچە، پاژ، لەت؛ ٢) کوتاڵی گران قیمەت ف ١) جزء؛ ٢) پارچهٔ قیمتی.
**پەرچەم:** موی سەرهەنیە، پەرچوکە ف موی بر پیشانی.
**پەرچی:** بێ‌نرخ‌و سوك: (هەرچی‌و **پەرچی**) ف سبك و کم‌بها.
**پەرخ:** شێلان‌و بەدەست ماڵین ف مالش با دست.
**پەرداخ:** ١) پیاڵەی ئاوخوری لەشوشە، گلاس، لیوان؛ ٢) جوان‌و لوس‌کراو؛ ٣) سازو بەکەیف ف ١) لیوان؛ ٢) آراسته؛ ٣) شاد و سرحال.
**پەرداغ:** پەرداخ ف پرداخته، مُهیّا.
**پەڕدال:** پەڕەی ژێری تیر ف پرهٔ ناوك تیر.
**پەردو:** ١) ژوری بوك‌و زاوا لەشەوی بوك‌گوێزانەوە، پەردەی بوك‌و زاوا؛ ٢) هەلاشی‌بان ف ١) حِجله؛ ٢) پوده.
**پەردوخ:** پڕوز ف نگا: پڕوز.
**پەردوخیان:** پروزان، سوتانی مو ف سوختن مُو.
**پەردوگیر:** تازەزاوا کە لەپەردودا بمرێ یان نەخوش کەوێ ف دامادی که در حجله بمیرد یا مریض شود.
**پەردە:** ١) پەردو؛ ٢) روپوشی دەرگاو پەنجەرەلە قوماش؛ ٣) لا، توێ ف ١) حجله؛ ٢) پرده؛ ٣) لایه.
**پەردەپلاو:** جوری پلاوە کە توتوی گوشتی تێدایە ف از انواع پُلو.
**پەردەپوش:** رازدار، ئەمین بوسورنەدرکاندن ف رازدار.
**پەردەدار:** خزمەتکاری ژوری تایبەتی حاکمان ف پرده‌دار.
**پەردەدڕان:** ١) روسیابون، ئاوڕو چون؛ ٢) شەرم‌شکان ف ١) رسواشدن؛ ٢) شرم از بین رفتن.
**پەردەژی:** دەس پێ‌ڕاگەین ف در دسترس بودن.
**پەردەك:** مەتەڵ، لەغەز، مەتەڵوکە ف چیستان، لُغز.
**پەردەگیر:** پەردوگیر ف دامادی که در حجله بمیرد.
**پەردەوژ:** پەردەژی ف در دسترس.
**پەردەهەناو:** پەردەی مناڵدان ف مشیمه.
**پەردێژ:** هەل، دەرفەت، کێس ف فُرصَت.
**پەڒرە:** هەلاجی کردن ف پنبه‌زنی.
**پەڕژ:** بلاو ف پراکنده.
**پەرژ:** هەل، دەرفەت ف فُرصَت.
**پەرژان:** گوێ پێدان، خەریك‌بون ف مشغولیت.
**پەرژیان:** پەرژان ف پرداختن به کار.
**پەرژین:** ١) هەلی کار لەبارەی شتێکەوە: (نام **پەرژێ**)، پەرزان؛ ٢) چیل، شورەی بەدڕو ف ١) پرداختن به‌کار؛ ٢) پَرچین.
**پەرس:** پەرست، لەپاش وشە بەمانای کەسێکە شتێ دەپەرەستێ: (خوا پەرس، خوٚ پەرس، پوڵ پەرس) ف پَرَست، در ترکیب بجای پرستنده *آید*.
**پەرسای:** پرسین ف پرسش.
**پەرست:** پەرس ف نگا: پەرس.
**پەرستار:** یاریدەری نەخوش، سیستر، خەمخوڕو ئاگاداری نەخوش ف پرستار.
**پەرستن:** خوشویستن، خذمەت کردن، بەپیروز زانین ف پرستیدن.
**پەرسدار:** خواپەرست ف خداپرست.
**پەرسڤ:** جواب، وەرام ف پاسُخ.
**پەرسگە:** جێگەی لەخوا پاڕانەوە ف مَعْبَد.
**پەرسە:** بپرسە ف بپرس.
**پەرسیف:** پەسیف، ئالامەت ف زُکام.
**پەرسیار:** پەرست ف پرستنده.
**پەڕسێلك:** پەرەسێلکە، پەرەسلێرکە ف پرستو.
**پەرسیلە:** قورە، بەرسیلە، پەسیلە ف غوره.
**پەرسیو:** پەسیف، ئالامەت ف زُکام.
**پەڕش:** ١) پەرژ، پرژ، بلاو؛ ٢) دەغلێکە لە جو ئەکاو کرەی ئەکەن ناوکەکەی وەك برنج دەکار دێنن، بڕویش ف ١) پراکنده، ٢) از انواع حبوبات شبیه جو.
**پەڕشت:** پەڕش ف از حبوبات.
**پەڕشە:** ١) پەڕشت؛ ٢) کاوکوتی دانەوێڵە ف ١) نگا: پەڕش؛ ٢) آنچه که از غلّهٔ بیخته دور ریزند.

**پەرڤۆنە:** پەپولە ف پروانە.
**پەرك:** سەرچنی کەڵاش ف بافتهٔ گیوه.
**پەڕك:** ١) پەڕەمەلی چکۆلە؛ ٢) پەڕی کاغەزە سیگار ف ١) پر کوچك؛ ٢) کاغذ سیگار.
**پەڕکاڵ:** ١) خرتوپرتی ناوماڵ؛ ٢) لێكو لەبار، پەرداخ ف ١) خرتو پرت؛ ٢) ساخته و پرداخته.
**پەرکەم:** ١) نەخۆشی تاو هەلامەت پێکەوە، ئەنفلۆەنزا؛ ٢) فێ، خوداری ف ١) بیماری انفلوآنزا؛ ٢) بیماری صرع.
**پەڕکوڕ:** جۆرێ هەڵۆی رەشی ژێر باڵ سپی ف نوعی عُقاب.
**پەڕکـولـۆڵ:** مەڕی سەروچاوڕەشی قەپوز سپی ف گوسفند سر و گردن سیاه بینی سفید.
**پەرکەما:** تەختی کەنارەی کەڵاش ف حاشیهٔ زیرین گیوه.
**پەرگ:** پەرك ف نگا: پەرك.
**پەڕگار:** جەغزینگ ف پرگار.
**پەڕگاڵ:** پەڕگار ف پرگار.
**پەرگەما:** پەرکەما ف نگا: پەرکەما.
**پەڕلەپێ:** جسنێ کۆتر ف نوعی کبوتر.
**پەڕمۆچ:** سیس، ژاکاو، (گولام پەرموچیە) ف پژمرده.
**پەڕمۆچان:** سیس‌بون، ژاکان ف پژمردن.
**پەرمون:** ١) دەخۆڕادیتن، بڕوا بەخۆیی؛ ٢) رەوینەوە، سڵ کردن ف ١) اعتماد بەنفس؛ ٢) رم کردن.
**پەرمێشك:** نوسەکە ف نوعی خار که بر پشم می‌چسبد.
**پەڕندە:** فڕندە، مەلێ کە ئەفڕێ ف پرنده.
**پەرننە:** پەڕندە ف پرنده.
**پەڕۆ:** پارچە قوماشی کۆن ف وصلهٔ پاره و کهنه.
**پەڕو:** پەڕۆ ف نگا: پەڕۆ.
**پەروّ:** جلکی بەخشەراو، خەلات ف لباس بخشیده شده.
**پەروا:** باك، ترس، سڵ کردن ف پَروا.
**پەروار:** دابەستە، بەختە ف پرواری.
**پەرواری:** دابەستە ف پرواری.
**پەرواز:** فڕین ف پرواز.
**پەروانە:** پەپولە ف پروانە.
**پەروّش:** خەم، داخی دڵ ف غم و اندوه.
**پەڕۆش:** چیلکەو چاڵو خشتو خاڵ ف خس و خاشاك، پوشال.
**پەڕوشك:** پریشکی تراو، پرشەی شتی ئاوەکی ف پاشیدنِ مایع.
**پەڕوشە:** پەڕوش، چیلکەو چاڵ ف پوشال، خس و خاشاك.
**پەروەر:** بەخێوکەر ف پرورانندە.
**پەروەراندن:** بەخێوکردن ف پرورانیدن.
**پەروەردگار:** خودا ف پروردگار.
**پەروەردە:** ١) بەخێو کردن؛ ٢) بەخێوکراو ف ١) پرورانیدن؛ ٢) پرورده.
**پەروەردە کردن:** بەخێوکردن ف پروریدن.

**پەروەرشت:** بەخێو کردن ف پرورش.
**پەروەری:** راهێنان ف تربیت.
**پەرە:** ١) پوڵ، دراو، پارە؛ ٢) برەو، رەواج؛ ٣) لەبەر ف ١) پول؛ ٢) رواج؛ ٣) برای.
**پەڕە:** ١) پەڕەی تۆپی ئاسیاو؛ ٢) کاری هەلاج ف ١) پرهٔ آسیاب؛ ٢) پنبەزنی.
**پەڕەپا:** پەڕلەپێ ف نوعی کبوتر.
**پەرەخاندن:** هەڵگلۆفین، گلۆفینو چرچ کردن ف مچاله کردن.
**پەڕەخەڕەك:** ئامرازێکی خەرەکی پەموڕێسی ف ابزاری در دوك.
**پەرەس:** پەرست ف پرستنده.
**پەرەسلێرکە:** پەرەسێلك ف پرستو.
**پەرەسلێنکە:** پەرەسلێرکە ف پرستو.
**پەڕەسوێلکە:** پەرەسێلکە ف پرستو.
**پەرەسەندن:** وەڕەواج کەوتن، لەزێدەبون، بەرەوزیادی چون ف تَرقّی کردن.
**پەرەسێلکە:** پەرەسلێرکە ف پرستو.
**پەرەسێن:** رو لە زیادی ف در رواج و نرقی.
**پەڕەك:** زۆرگانکەر ف بسیار جماع کننده.
**پەڕە کردن:** بەهەلاجی کردن ف حلّاجی کردن.
**پەرە کە:** پەراسوی حەیوان ف دندهٔ حیوان.
**پەڕە کەر:** حەلاج ف پنبەزن.
**پەرە گرتن:** لەزیادی بون ف رواج یافتن.
**پەرەم:** پۆل، تاقم، جوُن ف دسته.
**پەرەم پەرەم:** پۆل پۆل ف دسته دسته.
**پەڕەناو:** کلۆشی بەرپای گاگێرە ف ساقەهای جمع شده برای کوبیدن.
**پەرەنشك:** نوسەکە ف نگا: نوسەکە.
**پەرەنگ:** ١) لەرزانەی گوارە؛ ٢) پۆل، سکڵ ف ١) آویزه گوشواره؛ ٢) اخگر.
**پەرەنێشك:** نوسەکە، نوسەنەکە ف خاری است.
**پەڕەوازە:** ئاوارە، تەرە ف آوارە.
**پەڕهەلاویشتن:** لەئەندازە دەرچون ف از حدّ گذشتن.
**پەرەی:** بۆ، لەبەر ف برای.
**پەرهێز:** پارێز ف پرهیز.
**پەرهێزکردن:** خۆ دورخستن لەشتێ، پارێز لە خواردەمەنی کردن ف پرهیزکردن.
**پەرهێزگار:** دینداری ڕاست ف پرهیزکار.
**پەرهێزی:** پارێز لەخواردن ف پرهیز از خوراك.
**پەرێ:** ١) بۆخـاتـری، لەبـەر، بۆلای؛ ٢) پێرێ، دووژۆپـێش؛ ٣) سوکەڵەناوی پەروین ف ١) برای؛ ٢) پریروز؛ ٣) مُخفف پروین.
**پەڕی:** ١) نێر سواری مێوینـە بو، بۆ *حەیوانان* دەگوترێ؛ ٢) پارچەی لێوەبو؛ ٣) هەڵدێرا: (لەسەر ئەسپ پەڕی)؛ ٤) پەلکی چاو لەرزی ف ١) نر بر ماده سوار شد؛ ٢) پارچهٔ تکه و پاره؛ ٣) پرت شد؛ ٤) پلك

چشم لرزید.

**پەری:** ١) فرشتە، جوانی باڵداری خەیاڵی؛ ٢) پەردوی بوكو زاوا؛ ٣) نێویکی ژنانەیە ف ١) پری؛ ٢) حجلە؛ ٣) اسمی برای خانمها.

**پەری‌بڕ:** منداڵێ کە خەتەنەکردنی ناوێ ف بچّهٔ ختنه‌شدهٔ طبیعی.

**پەڕیتان:** ناوەڕوت، پەڕ روتانەوە ف پرکندنِ مُرغ بوسیلهٔ آب داغ.

**پەڕیتاندن:** روتانەوەی مەل ف پَرکَندن.

**پەریز:** ١) جێگەی دەغڵی درواو؛ ٢) بە دزەدزە بۆنێچیر چون؛ ٣) رەبەت، بۆسەی راوچی ف ١) جای غلّهٔ درویده؛ ٢) یواشکی به طرف نخجیر رفتن؛ ٣) کمین شکارچی.

**پەریزاد:** برێتی لەجوان چاکی مێوینە ف پریزاده.

**پەریزادە:** پەریزاد ف پریزاده.

**پەرێژ:** پەرژان ف پرداختن به کار.

**پەرێش:** بۆی ف برایش.

**پەرێشان:** ١) بڵاو؛ ٢) دڵ بەخەم ف ١) پراکنده؛ ٢) اندوهگین.

**پەرێشانی:** بێ‌سەرەو بەرەیی ف پریشانی.

**پەڕین:** ١) هەڵدێران؛ ٢) سواربونی نێر لەمێ؛ ٣) لەرزینی پەلکی چاو؛ ٤) شکانی شتی تورت؛ ٥) بازبردنو خۆهەڵدان؛ ٦) سڕبون لەسەرما ف ١) پرت شدن و افتادن؛ ٢) سوار شدن گشن بر مادینه؛ ٣) لرزش پلك چشم؛ ٤) شکستن چیز تُرد؛ ٥) جهیدن؛ ٦) بی‌حس شدن از سرما.

**پەڕێن:** لابەر: (دەغەز پەڕێنە ئاڵو باڵو) ف زداینده.

**پەڕینەوە:** لە ئاو یا لە خەیابان چونە ئەوبەر ف عبور از عرض.

**پەریهتن:** تولاّنەوە، داتولاّن ف لەشدنِ گوشت بر اثرِ زیاد پختن.

**پەز:** ١) مەڕ، مێ، یەكمەڕ؛ ٢) مێگەل لەمەڕو بزن؛ ٣) دوای وشە بەمانای لێنەرە: (ئاشپەز، چاپەز) ف ١) گوسفند؛ ٢) گلّه؛ ٣) بزنده.

**پەزاف:** دوئاو، بۆجاری دوهەم ئاودانی سەوزی ف آبیاری برای بار دوم.

**پەزاو:** پەزاف ف نگا: پەزاف.

**پەزشکـە:** نوسـەکە، نوسەنەکە، پەرەنیشك ف دوزە، خاری کە بر پشم گوسفندان ـ در وقت چرا ـ می‌چسبد.

**پەزمەندە:** پاشەکەوت ف اندوخته و پس‌انداز.

**پەزەکێفی:** مەڕەکێوی، مەڕەسور ف گوسفند کوهی.

**پەزەمەندە:** پاشەکەوت، گردەوەکۆیی ف اندوخته.

**پەزەمەنە:** پەزەمەندە ف اندوخته.

**پەزیر:** قبوڵکەر ف پذیرا.

**پەزیرایی:** خذمەتی میوان ف پذیرایی.

**پەزیرە:** چێشتی شەوێ کە بۆ رۆژ بمێنێتەوە، بەیات ف خوراك شب مانده.

**پەزیزانك:** جیکڵدانەی مەل، جیقڵدان ف ژاغر، چینەدان.

**پەزیشکە:** پەزشکە، نوسەکە ف نگا: پەزشکە.

**پەژ:** شلكو تورتو لەگەشە ف شاداب و تُرد.

**پەژار:** خەمبار ف غمگین.

**پەژارە:** ١) خەم، کەسەر، کول؛ ٢) تاسە، ئارەزوی دیدار؛ ٣) نیگەرانی ف ١) غم؛ ٢) آرزو؛ ٣) نگرانی.

**پەژارەدار:** خەمبار، دڵتەنگ ف غمگین.

**پەژان:** پەرژین، چیل ف پرچین.

**پەژك:** ١) دەستەچیلەی ئاگر؛ ٢) پوشو، قاو ف ١) آتشگیره؛ ٢) پُده.

**پەژم:** خوری، هەڕی ف پَشم.

**پەژمردە:** سیسو لەگەشە کەوتو ف پژمُرده.

**پەژموردە:** پەژمردە ف پژمُرده.

**پەژمەرین:** ژاکان، سیس‌بوُن ف پژمردن.

**پەژۆم:** زار، بێچارە، بێ‌ماڵو حاڵ ف بینوا، بیچاره.

**پەژە:** پەلك، گەڵا، بەڵگ ف برگ.

**پەژیران:** قبوڵکردن ف پذیرفتن.

**پەژیك:** ١) پەسیو، ئالاّمەت؛ ٢) آهۆ، پەتا، ئازار ف ١) زُکام؛ ٢) بیماری واگیردار.

**پەژێو:** پەرێشان حاڵ، پەشێو ف پریشان‌حال.

**پەژیوان:** پەشیمان، پێژەوان، پۆشمان ف پشیمان.

**پەژیوانی:** پۆشمانی ف پشیمانی.

**پەس:** ١) مەڕ، پەز، مێ؛ ٢) وەرەز، جاڕز، عاجـز، حێجـز؛ ٣) بێ‌ئاکـار، سوك، بێ‌شەرم؛ ٤) دۆڕاو لەقـومـاردا ف ١) گوسفنـد؛ ٢) پَکَـر؛ ٣) پست‌فطرت؛ ٤) بازنده در قمار.

**پەسـا:** ١) پێ‌خوێ، ئەوقـورەی بۆسـواغ گیراوەتـەوە؛ ٢) بێ‌پسانەوە، لەسەریەك؛ ٣) کەرستەی دۆڵمەو... ف ١) خازه؛ ٢) متوالی؛ ٣) مایهٔ دُلمه.

**پەساپۆرت:** ئیجازەنامەی سەفەر بۆ دەوڵەتی بێگانە ف پاسپورت.

**پەساپەسا:** یەك لەدویەکا بێ‌پسانەوە، پەستا ف بدون انقطاع.

**پەساخوڕ:** پاشاخوڕ، قەسەڵی بەجێماو لە ئاخوڕدا ف تەماندهٔ علف در آخور.

**پەسـار:** ١) لای‌سێبەر لەشاخو کێو، نزار، نسار؛ ٢) پەنابا، پەنای باران نەگر؛ ٣) حەشارگەی ڕاوچی ف ١) نِسار؛ ٢) جائی که با دو باران آنرا نگیرد؛ ٣) کمین شکارچی.

**پەساردن:** *پاش‌پێشگری هەڵ*. بەلاوەنان ف کنارگذاشتن.

**پەساردە:** بەلاوەنراو ف کنار گذاشته شده.

**پەسـاو:** ١) پاشاو، ئاوێ کە لە ئاوداشتندا لەزەوی دەردەچێ؛ ٢) ئاراو، پاشاراو؛ ٣) جێ ئاودانی مێگەل، پەزاو، دەراوی مەڕئاودان ف ١) آبی که از آبیاری زیاد آید؛ ٢) آب و صابونی که دو بار از آن استفاده شود؛ ٣) آبشخور گوسفندان.

**پەسپندە:** بەدفەڕ، ئاکار خراپ، ناپەسند، پەست ف پَست‌فِطرت.

**پەسپۆر:** سەڵیتەی زمان درێژ ف زن سلیطهٔ زبان دراز.

**پەسپەسکەرە:** جوڵاّتەنە، جاڵ‌جاڵۆکە ف زُرزوره.

**پەسپەسە کوڵە:** پەسپەسکەرە ف زُرزوره.

**پەسپەسە کەرە:** پەسپەسکەرە ف زُرزوره.

**پەسپەندە:** پەسپندە ف نگا: پەسپندە.

**پەست:** ١) ئاخن؛ ٢) نەوی، نزم؛ ٣) بێ‌غیرەتو بێ‌ناموس؛ ٤) وەڕەز، جاڕز، پەس ف ١) آکنده؛ ٢) کم‌ارتفاع، پست؛ ٣) بی‌غیرت، پَست؛

۴) پَکَر.

**پەستا:** پەسا، بیّ نیّوان، لەسەریەك ف بدونِ انقطاع.

**پەستاپەستا:** بەشویّن یەکدا، بیّ نیّوان برّ ف پیاپی.

**پەستان:** ئاخنین، بەهیّز تیّ‌راکردن ف آکندن.

**پەستاندن:** پەستان ف آکندن.

**پەستاندنەوە:** پەستان، بۆ پەنیر *ئاخنینەوەی دەڵیّن* ف آکندن.

**پەستــاو:** ۱) ئاخنــاو؛ ۲) ئاوی دانــەویڵەی کوڵاو: (لەواشیّکی لەدوڵچە چرچــەکــەی دەم / وەلــەو تامی نیە **پەستاوی** دانو) «ئەدیب» ف ۱) آکندە؛ ۲) آب غلّهٔ آب‌پز.

**پەستــاوتن:** ۱) ئاخنین، پەستــانــدن؛ ۲) شیّلان‌بە پا: (ســەربــانــەکە **بپەستیّوە**) ف ۱) آکندن؛ ۲) پایکوب کردن.

**پەستبون:** وەڕەزو توڕەبون ف پَکَرشُدن.

**پەستراو:** ۱) ئاخندراو؛ ۲) شیّلدراو ف ۱) آکندە؛ ۲) کوبیدە با پا.

**پەستراوە:** پەستراو ف نگا: پەستراو.

**پەستك:** کڵۆ میوەی پیّکەوە نوساو ف لتکە.

**پەستن:** پەستاوتن ف آکندن.

**پەستنەوە:** پەستن ف نگا: پەستن.

**پەستو:** ۱) کوپەڵەی کاشی؛ ۲) وچخانە، خەڵوەتی، ژوری ئەرزاق ف ۱) سبوی کوچك؛ ۲) پستو.

**پەستــۆ:** پاڵ پیّوەنانی توند، دەڵەك دانی بەنهیّم: (بەپاڵە **پەستۆ** دەرمان کرد) ف هول دادن.

**پەستواو:** ۱) ئاخنراو؛ ۲) شیّلراو ف ۱) آکندە؛ ۲) کوبیدە با پا.

**پەستــە:** چۆغــك، سوخمــەی بیّ‌قۆڵ لەلبــاد، پەستەك؛ ۲) سەربەندی گۆرانی، هەواسوکەڵە، بەستە ف ۱) چوخە؛ ۲) ترجیع و ترانهٔ شاد.

**پەستەك:** چۆغك، سوخمەی بیّ‌قۆڵی لەلباد ف چوخە.

**پەستەکۆڵە:** هەرەوەزی نمدماڵی ف مراسمِ نَمَدمالی.

**پەستی:** ۱) نەویایەتی، نزمی؛ ۲) بیّ‌ئاکاری؛ ۳) وەڕەزی ف ۱) پستی؛ ۲) پست‌فطرتی؛ ۳) پکری.

**پەستیّن:** کەسیّ کە کاری پەستاوتنە: (**بەفر پەستیّن**) ف چهاننده.

**پەسقەڵە:** قەشمەر، تیز بەخەڵك کەر ف مسخرەکنندە.

**پەسڵان:** ڕۆژی قیامەت، سەڵا ف روز رستاخیز.

**پەسمــەنــدە:** ۱) باقی، پاشمــاوە؛ ۲) پاشــەکــەوت، پەزمــەنــدە ف ۱) باقیماندە؛ ۲) اندوختە.

**پەسمەنە:** پەسمەندە ف نگا: پەسمەندە.

**پەسن:** ۱) تاریف، پیّهەڵگوتن، چاکەگوتن؛ ۲) بەردڵ و بەرانبەر بەداخواز ف ۱) ستودن؛ ۲) موردِ پسند.

**پەسند:** پەسن ف نگا: پەسن.

**پەسندان:** تاریف کردن، مەحت کردن ف مدح گفتن.

**پەسندکردن:** بەچاك زانین، هەڵبژاردن، نەقاندن ف پَسندکردن.

**پەسمەندە:** پاشەکەوت ف پس‌انداز.

**پەسن‌دەر:** پەسندار ف مدّاح.

**پەسە:** کەرستەی خواردەمەنی وەك ئاردوئاو بوّنان ف مواد اولیهٔ خوراك.

**پەسەك:** پەستەك، چۆغك ف چوخە.

**پەسەن:** پەسند ف پَسَند.

**پەسەناز:** پاشەکەوت ف پس‌انداز.

**پەسەنکردن:** پەسندکردن، هەڵبژاردن ف پسندیدن.

**پەسەنناز:** پەسەناز ف پس‌انداز.

**پەسیرە:** قۆرە، بەرسیلە ف غورە.

**پەسیّرە:** بەیات، شەومەندە ف شب‌ماندە.

**پەسیسە:** چیّشتی زۆر کوڵاوی لیّك‌هاڵاو ف آش بسیار پختهٔ درهم آمیختە.

**پەسیڤ:** ئاڵامەت، هەڵامەت ف زُکام.

**پەسیو:** ۱) پەسیڤ؛ ۲) سوچ، قوژبن، کەلیّن: (هیچ پەنــاو **پەسیویّکم** نیە) ف ۱) زکام؛ ۲) گوشە.

**پەش:** ۱) پەق، دەرهیّنــان و تۆقــانــدنی شتیّ؛ ۲) وشــەی لیّخوڕینی گا لەجوتا ف ۱) مُتلاشی کردن؛ ۲) کلمهٔ بەحرکت درآوردن گاو بەهنگام شخم.

**پەشت:** بەن یادەزوی بادراو، گشتەك ف نخِ تابیدە.

**پەشتی:** گشتەك، پەشت ف نخِ تابیدە.

**پەشتەماڵ:** پشتەماڵ، خاولی ف حولە.

**پەشك:** تنۆك، دڵۆپ، کەمترین ئەندازە لەئاو ف قطرە.

**پەشڵان:** پەسڵان، سەڵا، قیامەت ف رستاخیز.

**پەشم:** ۱) قسەی قۆڕو بیّتام؛ ۲) چۆغەی بُوزۆ؛ ۳) خوری ف ۱) یاوە؛ ۲) پارچە دستبافِ پشمی، شال؛ ۳) پَشم.

**پەشمبەرگویز:** ۱) چۆغەورانك؛ ۲) پارچەی سەروژیّری بەرگ لە بُوزۆ لەشاڵ، تۆ پە بُوزۆ ف ۱) لباس کامل مردانە مطابق کت و شلوار؛ ۲) پارچە دستبافِ پشمی بەاندازە یك دست لباس.

**پەشمەك:** جۆریّ شیرانی‌یە وەك موی‌سپی دەچیّ ف پَشمَك، توعی شیرینی.

**پەشمین:** دروس کراو لەخوری ف پشمینە.

**پەشمینــە:** پارچەیەکی زۆر جوانەو لەخوری ساز دەکریّ ف پارچەای بسیار زیبا کە از پشم درست می‌شود.

**پەشۆك:** پەریّشانی، شیّوان ف پریشانی، آشفتگی.

**پەشۆکان:** سەرلیّ شیّوان، فکرتیّکچون ف آشفتەشدن.

**پەشۆکاندن:** تیّکەڵاوکردنی فکری کەسیّك ف آشفتەکردن.

**پەشۆکاو:** شیّواو، سەرلیّ شیّواو ف آشفتە.

**پەشۆکیان:** پەشۆکان ف آشفتن.

**پەشە:** پەخشە، میّشولە، پیّشی، پیّشکە ف پَشّە.

**پەشەبەند:** کوللە، پیّشکە گیّرەوە ف پَشەبَند.

**پەشیل:** ویّران، ڕوخاو، هەڕفتی ف ویران.

**پەشیلان:** ویّران بون، ڕوخان ف ویران شدن.

**پەشیلاندن:** ڕوخاندن، هەرماندن، ڕماندن ف ویران کردن.

**پەشیلین:** پەشیلان ف ویران شدن.

**پەشیمان:** پاشگەز، پەژیوان، پۆژوان ف پشیمان.

**پەشێو:** پەرێشان، بیر بڵاو ف پریشان.

**پەشێوان:** ١) بیر بـڵاوبون، فکر ئاڵۆزان؛ ٢) ئاڵۆزو پەرێشان: (مەکەن لۆمەی **پەشێوی** دڵ کە ئەمشەو / **پەشێواوە** لەبەر پەرچەم **پەشێوان**) «نالی» ف ١) آشفتگی فکری دست دادن؛ ٢) پریشان و عصبانی شدن.

**پەشێواو:** شێواو، ئاڵۆزاو ف پریشان.

**پەشێویان:** پەشێوان ف نگا: پەشێوان.

**پەشێوی:** شێواوی، ئاژاوە ف آشفتگی، آشوب.

**پەشێوێنی:** ئاژاوە، پەشێوە ف آشوب و بلوا.

**پەفك:** پیفۆك، کیفۆك: گیایەکە کە سەلکەکەی بەکوڵاوی یان بەبرژاوی دەخۆن ف گیاهی است کە پیاز آنرا می‌خورند.

**پەڤ:** دەگەڵ، پێکەوە ف حرف همراهی: با.

**پەڤرا:** دەگەڵ یەکتر، پێکەوە، بەیەکەو ف باهم.

**پەڤك:** پەفك ف نگا: پەفك.

**پەق‌پەقوُژك:** گیایەکە ف گیاهی است.

**پەقان:** تەقین، ترۆقین ف اِنفجار.

**پەقاندن:** تەقاندن، تەرەقاندن ف منفجر کردن.

**پەقپەقۆشك:** گیایەکە بەرەکەی لەتروکاندندا تەقەی دێ ف گیاهی است.

**پەقپەقۆك:** بەری گیایەکە ف ثمر گیاهی است.

**پەقرەج:** سەتڵ ف سَطل.

**پەقژ:** زیپکەی ناودەمی ساوا، بۆقژە ف جوش ِ دهانِ کودك.

**پەقژك:** بڵقی سەراو ف حُباب.

**پەقویشك:** پەقژك ف حباب.

**پەقین:** تەقین، ترەکین ف اِنفجار.

**پەك:** ١) هەل، دەرفەت؛ ٢) ناچاریو ئیحتیاج؛ ٣) هێزو توان؛ ٤) وشەی سەیرمـان؛ ٥) وشـەی دەربـڕینی خەم: (پـەکم پێ ناکەوی) ف ١) فرصت؛ ٢) نیاز؛ ٣) توان؛ ٤) کلمهٔ تعجّب؛ ٥) کلمهٔ افسوس و تحسُّر.

**پەکخستن:** بێ بەهرە کردن، لەکارخستن ف ازکار انداختن.

**پەککو:** ١) وشەی سەیرمان؛ ٢) وشەی داخ و خەم، حەیف ف ١) کلمهٔ تعجب؛ ٢) کلمهٔ تحسُّر و افسوس.

**پەك کەفتن:** پەك کەوتن ف درماندن، از کاراُفتاده.

**پەك کەوتن:** دەستەو ستان مان، لەکارکەوتن ف نگا: لەکارکەوتن.

**پەك کەوتو:** لەکارکەوتو، داماو ف ازکار افتاده.

**پەك کەوتە:** لەکارکەوتو، داماو، پەك کەوتو ف ازکار افتاده.

**پەکو:** ١) وشەی سەیرمان؛ ٢) وشەی داخ‌وخەم ف ١) کلمهٔ تعجُّب؛ ٢) کلمهٔ افسوس.

**پەکەر:** ١) جارز، وەڕەز ف پَکَر.

**پەکی:** ١) زۆر، زاف، گەلـەك؛ ٢) وشەیەکە بەواتا: باش، چاك: (**پەکی** باوابێ) ف ١) بسیار؛ ٢) باشد، خیلی خوب.

**پەکین:** ١) هەڵدێران؛ ٢) ترازان ف ١) واژگون شدن و تلوخوردن؛ ٢) ازجا دررفتن.

**پەگـــر:** ١) تڵفی بنی تراو؛ ٢) خڵتـەی کانـزای تاواو ف ١) دُردی؛ ٢) تەنشین فلز گداخته شده.

**پەل:** ١) شەپـۆل، هەستانەوەی ئاو کە لەبەرد ئەدا؛ ٢) بەرانبەری قوُڵ: (دەوری **پەلە**)؛ ٣) لاق و دەست: (لـەچـوار **پەلان** گوێی ساغە)؛ ٤) باڵی باڵنـدە؛ ٥) پەلـەولەز: (بەرەوکوێ **پەل** بوی؟)؛ ٦) پارچە جلك و ئەسپاب: (کەل و **پەل**)؛ ٧) دەستە، پۆل؛ ٨) لکی دار؛ ٩) دڕکی دار؛ ١٠) سکـڵ، پۆلـو، پەنگر، پەن؛ ١١) شیوەڵە، دۆڵ، دەرە؛ ١٢) دڕك، چقـڵ: (پـەلێکم لەقـاچ راچوە)؛ ١٣) قڵیشەدار؛ ١٤) گەڵا، بەڵگ، پەلـك؛ ١٥) پارچە، پاژ: (**پەلێکم** بۆ لەونانەوە بکەوە)؛ ١٦) تیرەیەك لەهۆزو عاشرەت؛ ١٧) بڕاوی وەك نوُکەقەڵەم؛ ١٨) باسك و پەنجە: (دەست و پەلت پیسە) ف ١) موج؛ ٢) مقابل ژرف؛ ٣) هر یك ازدست و پاها؛ ٤) بال ِ پرنده؛ ٥) عجله و شتاب؛ ٦) بستهٔ لباس و وسایل؛ ٧) تیم، گروه؛ ٨) شاخـه؛ ٩) خار درختی؛ ١٠) اخگر؛ ١١) درّه تنگ و باریك؛ ١٢) خار؛ ١٣) تراشهٔ چوب؛ ١٤) برگ؛ ١٥) جزء؛ ١٦) تیره و طایفه؛ ١٧) تراشیده شُده؛ ١٨) دست و بازو.

**پەڵ:** بەرد یان سندەی گەورە بۆ هاویشتن ف سنگ یا کلوخ برای انداختن.

**پەڵاس:** ١) بەڕە، بەڕەکۆن؛ ٢) پارچەی رەشماڵ، کوێن ف ١) پلاس؛ ٢) پارچهٔ سیاه چادر.

**پەلاسی دەم:** ئەو بۆخـە سپیەی دەکـەوێتە سەر زمانی نەخۆش ف بار زبان بیمار.

**پەڵاش:** پوش، وشکەگیا ف خاشاك.

**پەلامار:** هێرش، هەڵمەت، گەمارۆ ف یورش.

**پەڵان:** هەستی، ئیسقان، ێیشە ف اُستخوان.

**پەلبون:** ١) قوُڵ نەبون؛ ٢) وەپەلەکەوتن لەڕۆیشتن ف ١) گودنبودن؛ ٢) باشتاب رفتن.

**پەڵپ:** بەهانە، گڕنە، گڕو ف بهانە.

**پەڵپ پێ گرتن:** کێشە تێ هاڵاندن، گرو لێ گرتن ف بهانەجویی.

**پەڵپ گرتن:** بەهانە دۆزینەوە، گرولەکارێ گرتن ف بهانەگیری.

**پەلپەل:** ١) پارچەپارچە، لەت‌وکوت؛ ٢) پەڕەپەڕەی گیای وەریو ف ١) تکّەتکّە؛ ٢) پرپر.

**پەڵپەڵان:** شەڕەبەرد ف جنگ با سنگ و کلوخ.

**پەلپەلیسك:** پەپولە ف پروانە.

**پەڵپین:** ١) نوشتەو دوکەڵی ئەسپەندەر بۆچا ِزار؛ ٢) گیای پرپرە ف ١) تعویذ و دودسپند برای چشم زخم؛ ٢) گیاه خُرفه.

**پەڵپینە:** گیای پرپرە، پەڵپین ف گیاه خُرفه.

**پەڵتە:** داری نێوان کوڵەکەو بەردە کوڵەکە ف چوب میان ستون و سنگ ستون.

**پەڵتەك:** نەخۆشی گەروی ئاژاڵە ف گلودردِ دام.

**پەلتەك:** بڕکەی بێستان ف بوتهٔ پالیزی.

**پەلتین:** خۆگرتن، توندبوُن دوای شلی ف سفت و محکم شدن پس از شُلی.

**پەلچم:** گزرەی گەڵادار کە بۆزستان هەڵدەگیرێ ف گیاه پرس شده.

**پەڵـخ:** ١) بەچکـە گامێش؛ ٢) بەچکە بەراز؛ ٣) پان‌و فڵچ ف ١) بچهٔ گاومیش؛ ٢) بچهٔ خوك؛ ٣) پایمال و له شده.

**پەلخان:** پان‌و فڵچ بونەوە ف لەشدن.

**پەڵخور:** لەوەڕی ناو ورگی حەیوان کەهێشتا هەزم نەبوە ف علفِ نشخوارنشده.

**پەڵخورد:** پەڵخور، نیوەجاوراو ف نگا: پەڵخور.

**پەڵخی:** پان‌و فڵچ کراو ف له و لگدمال شده.

**پەلخین:** پان‌و فڵچ بونەوە، پەلخان ف له و لگدکوب شدن.

**پەلشتی:** بێکارە، تەمەڵ، خوێڕی ف بیکاره و تنبل.

**پەلشقە:** ناقایم، شل‌و شەوێق ف نامحکم و شُل و ول.

**پەلقوت:** نیوەکوتراو ف نیم کو بیده.

**پەلـك:** ١) زولف، کەزی؛ ٢) گەڵا؛ ٣) لکـەدار؛ ٤) پیلوی چاو ف ١) زُلف؛ ٢) برگ؛ ٣) شاخه؛ ٤) پلك چشم.

**پەڵك:** دارێکە لەتیرەی چناران ف درختِ ترنگوت.

**پەلکدار:** جەغزینگ، پەرگار ف پرگار.

**پەل کردن:** ١) پەڕاندن بەتیغ؛ ٢) خوارەوخوار تاشین، پێڵە تاشین ف ١) پی کردن؛ ٢) مورب تراشیدن.

**پەل کوتان:** ١) دەست کوتان، لەتاریکی‌دا دەست گێڕان؛ ٢) برێتی لە کۆشش‌و تەقالا ف ١) جستجوی کورانه؛ ٢) کنایه از جِدّ و جَهد.

**پەلکە:** کەزی، پرچ ف زُلف؛

**پەلکەرەنگینە:** کۆلکەزێڕینە، کەسك‌سوّر ف رنگین کمان.

**پەلکەزێڕینە:** پەلکەرەنگینە ف رنگین کمان.

**پەڵگ:** پیلوی چاو ف پلك چشم.

**پەلگر:** ماشە، مقاش ف ماشه.

**پەلگرك:** پەلگر ف ماشه.

**پەڵم:** ١) پەڵپ؛ ٢) ئەستوری، ماسین، پەنەمین ف ١) بهانه؛ ٢) آماس.

**پەڵماو:** ماسیاو، ستوربو، هەڵامساو، پەنەماو ف آماسیده.

**پەڵمان:** پەنەمین، ماسین ف آماسیدن.

**پەڵمین:** پەڵمان ف آماسیدن.

**پەڵـو:** ١) ئاردوئـاوی تێکەڵ بۆ دانەجوچکە؛ ٢) چێشتێکە وردەهەویر و کوزەڵەی تێدە کەن ف ١) آرد آبزده برای جوجه؛ ٢) اوماج.

**پەلوپۆ:** ١) برێتی لە تەقەلاو بزوتنەوە؛ ٢) هێزو توان: (لە **پەلوپۆ** کەوتم)؛ ٣) پەڕوباڵ ف ١) کوشش؛ ٢) تاب و توان؛ ٣) پروبال.

**پەڵوُخ:** پۆلوی گەش ف زُغالِ سرخ شده.

**پەلـۆخ:** ١) داگیرسـاو، گڕتێ‌چو، گڕگرتـو؛ ٢) داڕزاو لەسوتان ف ١) مشتعل؛ ٢) بر اثر سوختن از هم پاشیده.

**پەڵۆخ:** ١) پیس‌و چڵکن؛ ٢) لێدان بەدارو بەدەست ف ١) کثیف؛ ٢) با شدّت زدن.

**پەڵۆخان:** لێدا نی‌توندو لەزەبر ف با مشت و لگدزدن.

**پەڵۆخین:** لێدان بەهێز، پەڵۆخان ف نگا: پەڵۆخان.

**پەڵۆشە:** ١) گیایەکە ساقەتەکەی دە کەنە پوشو؛ ٢) گوێنی؛ ٣) بنەتاڵو ف ١) گیاهی که از ساقهٔ آن پوده سازند؛ ٢) گیاه گون؛ ٣) ریشهٔ گیاهی که هودشود.

**پەلوك:** گیای ئاڵەکۆك ف گیاهی است که بیخش خوردنی است.

**پەڵوڵە:** ١) چێشتی ئاردورۆن؛ ٢) گزموله ئاردی دانەجوجك، پەڵو ف ١) اوماج؛ ٢) آرد آبزده برای خوراك جوجه.

**پەلە:** ١) لەز، عەجەلە؛ ٢) بناری کێو، دامێنی چیا؛ ٣) داوێن؛ ٤) پەڕە، لاپەڕەی کتێب؛ ٥) تای تەرازو ف ١) عجله؛ ٢) دامنهٔ کوه؛ ٣) دامان؛ ٤) لا، ورق؛ ٥) کفّهٔ ترازو.

**پەڵە:** ١) لەکە؛ ٢) بارانی تێری دەخڵ؛ ٣) پارچە زەوی؛ ٤) لەزوپەلە ف ١) لکّـه؛ ٢) باران پاییزی که زمین را کامـلاً سیراب کنـد؛ ٣) قطعهٔ زمین؛ ٤) شتاب.

**پەلەپچڕ:** زۆر بەزەحمەت‌و پەلەکردن ف بازحمتِ تمام.

**پەلەپچڕکێ:** پەلەپچڕ ف بازحمت تمام.

**پەلەپچڕێ:** پەلەپچڕ: (لەچەنگی فلاّن بە **پەلەپچڕێ** نەجاتم بو) ف نگا: پەلەپچڕ.

**پەلەپچوڕکێ:** پەلەپچڕ ف نگا: پەلەپچڕ.

**پەلەپروزکێ:** پەلەپچڕ ف نگا: پەلەپچڕ.

**پەلەپڕوزە:** پەلەپچڕ ف نگا: پەلەپچڕ.

**پەلەپڕوزێ:** پەلەپچڕ ف نگا: پەلەپچڕ.

**پەلەپڕوسکە:** پەلەپچڕ ف نگا: پەلەپچڕ.

**پەلەپڕوسکێ:** پەلەپچڕ ف پەلەپچڕ.

**پەلەپسکێ:** نەخۆشی باڵەشۆڕەی مریشك ف نوعی بیماری مرغ.

**پەلەپڤە:** نانی دوبارە بەئاگرەوەناو ف نان دوآتشه.

**پەلەپەل:** گەلەك بەلەز ف بسیار باعجله.

**پەلەپیتك:** بەهێز بەنینۆك لەشت‌دان ف تلنگر.

**پەلـەپیتکە:** ١) پەلەپیتك؛ ٢) بەردوکەی بەپتکە هاوێژراو ف ١) تَلَنگُر؛ ٢) با تَلَنگُر پرت کردن.

**پەڵەت:** هەڵە، غەڵەت: (هەمو کارێکت هەڵەت **پەڵەتە**) ف غلط، اشتباه.

**پەلەتاتە:** کڕیوەو بادەوە ف کولاك.

**پەلەتك:** پەتك، لەتەگوریس ف رَسَن پاره.

**پەلـەخ:** ١) پاوان، لەوەڕگەی قەدەغـە، کۆدە؛ ٢) داتوڵاو بەئاگر ف ١) مرتع انحصاری؛ ٢) بر اثر سوختن تمام از هم پاشیده.

**پەڵەخ:** گیایەکە لە قوپی‌دا دەڕوێ‌و وەك پوُش‌وایە ف گیاهی است.

**پەلەخاندن:** لەبەریەك بردن، دارزاندن ف ازهم پاشیده کردن.

**پەلەخۆر:** ژیلەمۆ ف خاکستر گرم.

**پەلەسۆرك:** گەڵای پایزپێش زەردبون ف برگ پاییز قبل از ریختن.

**پەلـەسـۆنـك:** بن‌گەڵا، دوگەڵای بنەوەی توتن کە دەوەرێ ف دو برگ انتهائی توتون که می‌ریزند.

**پەلەسیسە:** نەخۆشی رەز کە گەڵای سیس دەبن ف نوعی بیماری مو.

**پەلـەشت:** ١) پیس‌و پۆخڵ؛ ٢) خوێڕی‌و بێکارە؛ ٣) خۆنەگرتو ف ١) چرکین؛ ٢) تنبل و بیکاره؛ ٣) نیم‌بند و نامحکم.

**پەلەشتی:** پەلشتی، چۆنیەتی پەلەشت ف پَلَشتی.

**پەلەشەکرۆك:** ناوەرۆکی سەلکی گیای کەرتەشی ف مغز خاری است.

**پەلەفرتکێ:** پەلەقاژە ف دست و پازدن.

**پەلەفرتە:** پەلەقاژە ف نگا: پەلەفرتکێ.

**پەلەفرتێ:** پەلەفرتکێ ف نگا: پەلەفرتکێ.

**پەلەقاژە:** دەستولاق جولاندنەوە بۆ رزگاربون لەچۆرتم ف دست و پازدن.

**پەلەقاژێ:** پەلەقاژە ف دستوپازدن.

**پەلە کردن:** لەزکرن ف شتاب کردن.

**پەلە کوتێ:** پەلکوتان ف کورکورانە دست زدن.

**پەلە کێش:** پەلگر، ماشە ف ماشە.

**پەلەمار:** پەلامار، هێرش ف هجوم.

**پەلەمور:** خۆڵەمێش، خۆڵەکەوە، خۆلی ف خاکستر.

**پەلەندار:** پلار، دارەدەست بۆ هاویشتن ف چوبدست انداختن.

**پەلەنگ:** پڵینگ ف پلنگ.

**پەلەور:** باڵدار، فرندە ف پرندە.

**پەلەورگ:** لەتەورگ ف تِکّە شکمبە.

**پەلەوەر:** پەلەور ف پرندە.

**پەلهەوان:** ١) ئازا، پاڵەوان؛ ٢) تەناف باز ف ١) پهلوان؛ ٢) بندباز.

**پەلیت:** قسەی بێتام: (**هەلیت و پەلیت دەلێ**) ف سخن و حرف بی‌مزە.

**پەلیسە:** تالان، پوڕ، پویڕ ف چپاول.

**پەلی سیاوشان:** قەیتەران ف پرسیاوشان.

**پەلێك:** ١) چێشتی زۆرکولاوی لێك هالاو؛ ٢) پارچەی پرچ‌پێچ ف ١) آش زیاد پختە؛ ٢) زُلف‌بَند.

**پەم:** پەمۆ، گیای لۆکە ف پنبە.

**پەمبلۆکێ:** دۆك، نەخۆشی رەز کە گەلای سپی دەبێ ف سپیدك مو.

**پەمبۆ:** پەم ف پنبە.

**پەمبۆدانە:** دەنکی ناو لۆکە ف پنبەدانە.

**پەمبەیی:** رەنگی گوڵی، چێرەیی، رەنگی سوری کاڵ، سورەتی ف رنگ صورتی.

**پەمبی:** پەم ف پنبە.

**پەمبی دانك:** پەمبۆدانە ف پنبەدانە.

**پەمبی لۆك:** گیایەکە ف گیاهی است.

**پەملەپڕێ:** تفەنگی رەشۆکی ف نوعی تفنگ.

**پەمو:** پەم ف پنبە.

**پەمۆ:** پەم ف پنبە.

**پەموانە:** پەمبۆدانە ف پنبەدانە.

**پەمۆدانە:** پەمبۆدانە ف پنبەدانە.

**پەمە:** پەم ف پنبە.

**پەمەتۆمە:** پەمبۆدانە ف پنبەدانە.

**پەمەیی:** ١) پارچەی لەلۆکە؛ ٢) رەنگی چێرەیی ف ١) پارچۀ نخی؛ ٢) رنگ صورتی.

**پەمیان:** پەنەمان، ماسین، ئەستوربون ف آماسیدن.

**پەمیاو:** پەنەماو، هەڵمساو ف آماسیدە.

**پەمین:** پەمیان ف آماسیدن.

**پەن:** ١) پۆلو، پەنگر، سکڵ؛ ٢) دەرسی عیبرەت، پەند؛ ٣) سوکایەتی: (**پەنی پێدرا**) ف ١) اخگر؛ ٢) درس عبرت؛ ٣) سَبُکی.

**پەنا:** ١) گۆشە، قوژبن؛ ٢) تەنیشت: (**بە پەنای مندا هات**)؛ ٣) جێگەی بانگ و هاواران: (**پەنام پێ‌برد**)؛ ٤) جێگەی حاوانەوە: (**پەنای دام**)؛ ٥) نهێنی، وەشاردو: (**من پیاوێکی بێ‌پێچ و پەنام**) ف ١) گوشە؛ ٢) جَنب؛ ٣) پناه؛ ٤) پناهگاه، مکان پناه بردن؛ ٥) نهانی.

**پەنابا:** باپەنا، شوێنێ کەبا نایگرێتەوە ف بادپناه.

**پەنابات:** دەشایی ئێران، نیوەقەران، بیستیەکی تمەن ف نیم ریالِ ایرانی.

**پەناباد:** پەنابات ف نگا: پەنابات.

**پەنابردن:** چوُنە بەردالدەی پارێزەر ف پناه بُردن.

**پەنابەخوا:** خوا تۆبە. بۆ خۆ *پارازتن لە بەلا* دەگوترێ ف پناه برخدا.

**پەنابەر:** دالدەخواز ف پناهندە.

**پەناپەسیو:** گۆشەو قوژبنی نادیاری ف گوشە دنج.

**پەناگا:** شوێنی خۆتێدا حەشاردان ف پناهگاه.

**پەناگرتن:** ١) درەنگ هەلاتنی مانگ لەشەوی پازدەهەمدا؛ ٢) خۆوەشارتن ف ١) حالتِ تأخیرِ ظهورِ ماه در شبِ پانزدهُم؛ ٢) پنهان شدن.

**پەناگرتو:** ١) خۆ وەشارتو؛ ٢) مانگی دوای چاردە شەوە ف ١) پنهان شدە؛ ٢) ماه بعد از شب چهاردهم.

**پەنام:** ١) نەدیار؛ ٢) ماسین، ئەستوری، هەڵمساوی ف ١) پنهان؛ ٢) آماس.

**پەنامان:** نادیاریەکان، بەرپێواران ف غیبیات، ناپیداها.

**پەنامگا:** حەشارگە ف مخفیگاە.

**پەنامەکی:** بەنهێنی، بەدزیەوە ف سرّی، نهانی.

**پەناهندە:** پەنابەر، کەسێ کە پەنا بەکەسێ دەبا ف پناهندە.

**پەناهێنان:** هاتنەبەر دالدە، پارێزگاری خواستن ف پناە آوردن.

**پەنای بێدەنگ:** گەمەیەکە، قروقپ، فەنای بێدەنگ ف بازی خاموشی و سکوت.

**پەنبۆ:** پەم ف پنبە.

**پەنبی:** پەم ف پنبە.

**پەنج:** ١) یەك‌وچوار، پێنج؛ ٢) سڕ، بێ‌حس ف ١) پنج؛ ٢) بی‌حس، کِرِخ.

**پەنجا:** چل‌ودە، پێنجی ف پنجاه.

**پەنجاهەم:** ژمارەی نۆبەتی بۆ پەنجا ف پنجاهمین.

**پەنجاهەمین:** پەنجاهەم ف پنجاهمین.

**پەنجایەم:** پەنجاهەم ف پنجاهم.

**پەنجایی:** مەنگەلە، پارەی پەنجا فلسی، یەك بیستەمی دیناری عیراقی ف یك درهمِ عراقی.

**پەنج کردن:** تەزاندن، سڕکردن ف کِرِخ کردن.

**تماشا:** ۱) روانین، چاولێکردن، تواشا، نۆڕین، مەیزەکرن؛ ۲) بڕوانە ف ۱) تماشا؛ ۲) نگاه کن.

**تماق:** ئاوخۆرە، دەفری ئاوخواردنەوە، زەرك، شەربە ف کاسهٔ آبخوری.

**تمام:** تەواو، گش ف تمام.

**تماندن:** داهێنان، خوارەوە کردن ف خم کردن.

**تماو:** ۱) داهاتو، خوارەوەبوگ؛ ۲) پەسیو، هەڵامەت ف ۱) خمیده؛ ۲) زُکام.

**تماوی:** پەسیوگرتی، هەڵامەتدار ف مبتلا به زکام.

**تمتم:** زەوینی رەقەن، زەمینێ کە بنی تەختەبەرد بێ ف زمین سنگلاخ.

**تمتمان:** تمتم ف نگا: تمتم.

**تمتمە:** نوکەمەزرەقی لە ئاسن ف نك آهنی گردنا.

**تمتیل:** ۱) بیچم، سەروشکڵ؛ ۲) کورتە چیرۆك ف ۱) قیافه؛ ۲) داستان کوتاه.

**تممی:** هەمیشەیی، بێبڕانەوە ف همیشگی.

**تموتم:** ۱) بێکەمو زیاد؛ ۲) هەمیشە ف ۱) بی کم و زیاد؛ ۲) همیشه.

**تمەز:** بەمەزەنەنە، وا دیارئەدا، خویایە ف اِنگار، تونگو.

**تمەن:** دەقڕانی سکەی ئێران ف تومان.

**تن:** ۱) پاشگری کاری رابردو بۆکەسی سێهەم لەدوای پیتی بزاو دێت: (**دخوتن دچیتن، ناباتن**)؛ ۲) قنگ؛ ۳) قایمو شەداندی، توند ف ۱) علامت سوم شخص مفرد در فعل؛ ۲) مقعد؛ ۳) مُحکم.

**تناز:** ۱) خۆشـاندان بەنازو قەمزەوە: (**تنازادکی**)؛ ۲) گاڵتە، تیز ف ۱) نازکردن؛ ۲) مسخره.

**تنراو:** کر. تەندراو، تەناو، رایەڵی پۆتێوە دراو ف تنیده، منسوج.

**تنگێللە:** تنگێڵە ف نگا: تنگێڵە.

**تنـگـێڵە:** ۱) مەشـکـەی پڕاوپـڕ لە ئاو؛ ۲) برێتـی لەزۆر خۆری زگ‌هەڵامساو ف ۱) مَشك لبریز از آب؛ ۲) کنایه از پرخور شکم برآمده.

**تننە:** هیچ‌شت‌نیە، هەرنیە، هیچ‌نیە ف چیزی موجود نیست.

**تنۆك:** ۱) دڵۆپ، قەترە؛ ۲) تاریکی زۆر تاریك ف ۱) قطره؛ ۲) بسیار تاریك.

**تنۆك:** زۆرتاریك: (شەوێکی تاریك‌و **تنۆکە**) ف بسیار تاریك.

**تنۆکە:** ۱) دەرپێی زۆرکن‌و کورت، دەرپێی لەقنگ‌هاڵاو؛ ۲) دڵۆپ، تنۆك ف ۱) تُنبانِ کوتاه؛ ۲) قطره.

**تنە:** نیە ف نیست، موجود نیست.

**تۆ:** ۱) راناوی کەسی روبەڕو: (من نایەم **تۆ**وەرە)؛ ۲) یەك‌لا، یەك‌قەد: (بە **تۆی** کراس‌و دەرپێ دەرپەڕی)؛ ۳) تۆی شیر، قەیماغ؛ ۴) تۆم، تۆوی سەوزی‌و دەخڵ، توخم؛ ۵) جۆر، نەوع: (چتۆ؟ فتۆ؟) ف ۱) ضمیرِ مُخاطبِ مُفرد؛ ۲) یك‌لا؛ ۳) سرشیر؛ ۴) بَذر، تُخم؛ ۵) جور، نوع.

**تو:** ۱) راناوی روبەرو؛ ۲) هیچ: (**تو** جاران: هیچ جاران)؛ ۳) تفێ ف ۱) ضمیر مخاطب مفرد؛ ۲) هیچ؛ ۳) توت.

**توا:** ۱) پارچـەی بڕاوی ناسـك لە گۆشـت یا لە چەرم؛ ۲) دەیەوێ؛ دەخوازێ ف ۱) شرحه؛ ۲) می‌خواهد.

**توار:** مەل، باڵدار، پەڕندە: (تەیرو **توار**ێکی زۆری لێ کۆ بۆتەوە) ف پرنده.

**تواشا:** تماشا ف تماشا.

**تواشاخانە:** تەماشاخانە، جێگەی شاندانی شتی دڵخواز ف تماشاخانه.

**توال:** توار ف نگا: توار.

**تـوالێت:** قـژی سـەرتوێڵ، کاکۆڵی سەر هەنیە، گودلە ف کاکُل روی پیشانی.

**توام:** دەمەوێ، گەرەکمە، دەخوازم ف می‌خواهم.

**توان:** ۱) ویستن، خواستن؛ ۲) هێز، تاقەت، تابشت ف ۱) خواستن؛ ۲) تاب و توان.

**توانا:** بەهێز، بەوزە، بەتاقەت ف توانا.

**توانایی:** هێز، تابشت ف توانائی.

**توانج:** سەرکۆنە، تانە، تیز ف طعنه، سرزنش.

**تواندنەوە:** تاواندنەوە، حەلاندن ف ذوب کردن.

**توانەوە:** تواندنەوە ف ذوب کردن.

**توانەوە:** تاوانەوە، لەڕەقیەوە بونەئاو، حەل‌بوُن ف ذوب شدن.

**توانست:** توان، تابشت، تاقەت ف توان.

**توانستن:** توانین، لەوزەدا بون ف توانستن.

**توانشت:** توانست ف توان.

**توانین:** توانستن ف توانستن.

**توایهم:** عافەرەم، بارە قەڵلا، چاکت کرد ف آفرین.

**تۆبرە:** ۱) تورەکە، قوماشی هەڵدوراو بۆ شت تێکردن؛ ۲) توری وڵاغ، تورەکەی لەوەڕی جارەوێ؛ ۳) توربێنی وەك خورجی وەرزێر بۆ تۆم تێدا بردن ف ۱) توبره؛ ۲) آخور کیسه‌ای؛ ۳) کیسه‌ای که بذر را در آن ریزند.

**تۆبە:** پەژیوان‌بون لە گوناح ف توبه.

**تۆبەدار:** لەخواترس: (خاتونێ ئەز **تۆبەدارم**) ف پرهیزگار.

**توبەرە:** ۱) توربێن؛ ۲) ئاڵقەی دانە لغاو کەلچی ژێروی ئەسب دەگرێ ف ۱) توبره؛ ۲) حلقهٔ زیر لب دهنهٔ اسب.

**تۆبـەکـار:** لەخـواتـرس‌و بەدین، تۆبـەدار: (بـابچینـە سەروەیس بە **تۆبەکاری** / تۆبە لەهەرشت غەیر لەدڵداری) «فۆلکلۆر» ف پرهیزگار.

**تۆپ:** ۱) کۆمـەڵ‌و پرایی؛ ۲) گردەڵـی ئاسـیاو کە پەڕەی لێدراوە؛ ۳) ئەوشتـە گردەی بەدەست یا بەپـا بازی پێ‌دەکـەن؛ ۴) تفەنگی لولە ئەستوری گوللە درشت؛ ۵) قوماشی بەسەریەکدا قەدکراو بە لولە یان لەسەر تەختە؛ ۶) برێتی لە درۆی گەورە؛ ۷) خڕ، گرۆوەر، گرد ف ۱) توده؛ ۲) جای پرّهٔ آسیاب؛ ۳) توپ بازی؛ ۴) توپ جنگی؛ ۵) توپ پارچه؛ ۶) کنایه از دروغ شاخدار؛ ۷) گرد، مدوّر.

**تۆپان:** سەکەت‌بون، کەوتین، مرداربونی حەیوانێ کە گۆشتی ناخورێ ف مُردار شدن.

**تۆپاندن:** ۱) سەکەت کردن، کەوتاندن؛ ۲) تەمێ کردن، لێدانی زۆر ف ۱) مُردارکردن؛ ۲) کتك‌کاری و تنبیه‌کردن.

**تۆپانن:** تۆپاندن ف مُردار کردن.

**تۆپانێ:** گەمە بە تۆپ کردن، تۆپێن، تۆپێنە ف توپ‌بازی.

**تۆپ‌تۆپێن:** تۆپانێ ف توپ‌بازی.

**تۆپتاو:** ئەودارەی کە لە گەمەدا لەتۆپی ئەدەن ف چوگان.

**تۆپچی:** ١) تۆپ تەقێن؛ ٢) درۆزل ف ١) توپچی ارتش؛ ٢) کنایە از کذّاب و دروغگو.

**تۆپدان:** شکست پێدان ف هَزیمَت دادن.

**تۆپز:** کوتەکی سەر بەبزماریان قیرتێ هەڵسوراو ف چُماق یا چوبِ قیراندود.

**تۆپشك:** گیایەکە ف گیاهی است.

**تۆپقاڕ:** گەمەی تۆپێن کە بەدار لەتۆپ دەدرێ ف چوگان‌بازی.

**تۆپقاڕێن:** تۆپقاڕ ف نگا: تۆپقاڕ.

**تۆپکەشی:** خاوێن کردنەوەی گونجە بەداری سەر بەپەڕۆ ف پاك کردن آبریز بەوسیلهٔ چوبی کە کهنه بر آن پیچیده‌اند.

**تۆپلاخ:** ١) بەسەریەکا کۆم بو، بەسەریەکا هاتو؛ ٢) گڵمەت، سندە ف ١) برهم انباشته؛ ٢) کلوخ.

**تۆپلاخە:** بەسەریەکا هاتو: (پەین‌و قوڕ بە سەریەکا **تۆپلاخەی** کردوە) ف برهم انباشته.

**تۆپـەڵ:** ١) خڕ، گرۆوەر؛ ٢) بەسەریەکا هاتو، لەسەریەك کۆم‌کراو؛ ٣) قوڕیان بەفر ئەوەندەی لە دەستێکا جێگەی بوێتەوە ف ١) گرد، مدوّر؛ ٢) برهم انباشته؛ ٣) مقداری گل یا برف کە در یکدست جای گیرد.

**تۆپەڵ بون:** ١) لەدەوری یەکتر کۆبون؛ ٢) بەسەریەکا هاتن ف ١) دور هم جمع شدن؛ ٢) روی هم انباشتن.

**تۆپەڵە:** خڕی وەك تۆپ ف گِرد چون توپ.

**تۆپەڵەشەڕی:** شەڕە بەفر، تۆپەڵە بەفر بەیەکا دان ف برف‌بازی.

**تۆپەوانە:** پەڕۆی زارئاخنی کوپەو دەفر ف پارچهٔ دهان‌بند خُم و...

**تۆپیگ:** مردارەوە بوی حەیوانێ کە گۆشتی ناخورێ ف مُردار.

**تۆپین:** مردنی حەیوانی پیس: (سەگ **تۆپی**، کەر **تۆپی**) ف مُردار شدن.

**تۆپێن:** ١) گەمەی بەتۆپ، وازی تۆپانێ؛ ٢) کەسێ کە گیانداری پیس نەکوژێ ف ١) توپ‌بازی؛ ٢) کسی کە حیوانی را مُردار کُند.

**تۆپیو:** تۆپیگ ف نگا: تۆپیگ.

**توت:** ١) تفێ، بەری دارتو، داری تفێ؛ ٢) وشەی دەرکردنی سەگ ف ١) توت؛ ٢) کلمهٔ راندن سگ.

**تۆت:** ١) کونـدەبـو؛ ٢) دانیشتن لەزمانی مناڵدا: (**تۆتی** کردوە) ف ١) بوف؛ ٢) نشستن بە زبان بچه‌گانه.

**توتاك:** ١) قومری، جۆرە کۆترێکە، یاکەریم؛ ٢) تاق‌تاق کەرە، ڤژاوکە ف ١) قُمری؛ ٢) مُرغِ شباهنگ.

**تۆتان:** وەچینچك نیشتن، هەڵ توتەکان ف چمباتمه نشستن.

**توتانن:** ١) وەقسەهێنان؛ ٢) دواندن‌و جارز کردن ف ١) بەحرف آوردن؛ ٢) سر بەسر گذاشتن.

**توتـڕك:** توڕك، دڕی، بەری دڕکێکـە وەك گاتـو دەچێ لەتـام‌و رەنگا ف تمشك، سەگُل.

**توتـرواسك:** مەلێکە بەقەد چێشکە ف پرنده‌ای است شبیه گنجشك.

**توتك:** ١) بێچوە سەگ؛ ٢) سەولەی سەگ؛ ٣) توتی؛ ٤) کرمی نەخۆشی هاری ف ١) تولەسگ؛ ٢) نوالهٔ سگ؛ ٣) طوطی؛ ٤) ویروس هاری.

**توتکـە:** ١) توتەکۆڵە؛ ٢) کرمێ کە لەهار پەیدا دەبێ؛ ٣) ئۆقرە ف ١) تولەسگ؛ ٢) ویروس هاری؛ ٣) آرامش.

**توتکەخواردن:** ئارام گرتن ف آرام گرفتن.

**توتکە گرتن:** توتکە خواردن ف آرام گرفتن.

**توتم:** سماق، داری ترش ف سُماق.

**توتن:** تەماکۆ، ئەوگیاتاڵەی دوکە ڵەکەی هەڵدەمژن ف توتون.

**توتنـانـە:** بەشی خاوەن مڵك لە توتنی رەعیەت ف سهمی کە ارباب از توتون‌کار می‌گیرد.

**توتنای:** وەقسەهێنان ف بەحرف آوردن.

**توتنەوان:** رەنجبەری توتن کێڵ ف توتون‌کار.

**توتـو:** وشـەیەکە بەواتا: بەهیچ جۆرێك: (بە **توتوش** دەس ناکەوی) ف کلمه‌ایست کە محال بودن امری را می‌رساند.

**توتوك:** شەیپور، کەڕەنا ف شیپور.

**تۆتـوی:** جۆرێ کولێرەی توێ لەسـەر توێ کە گوێزو بادام‌و پیوازی تێ‌دەکەن ف نوعی گرده نان کە گردو و بادام و پیاز در آن ریزند.

**تۆتە:** ١) قامکە چکۆڵە؛ ٢) دانیشتن لەزمانی مناڵدا: (**توتە** بکە، ئۆخەی کوڕی من **توتەی** کردوە)؛ ٣) سەگ؛ ٤) وشەی دەرکردنی سەگ؛ ٥) زێدە گۆشت لەچـاودا یان لە پێڵوی چاودا؛ ٦) خاڵ، نیشـان ف ١) خنصر؛ ٢) نشستن در زبان بچّه‌گانه؛ ٣) سگ؛ ٤) کلمهٔ راندن سگ؛ ٥) گوشت اضافی در چشم یا پلك چشم؛ ٦) خال.

**تۆتەك:** چوزەلە، دوزەلە ف مزمار.

**تۆتەکان:** هەڵتروشکان ف چمباتمه نشستن.

**توتە کۆڵە:** توتکەسەگ ف تولەسگ.

**توتەڵە:** توتکەسەگ ف تولەسگ.

**تۆتی:** مەلێکە لەقسەدا لاسای مرۆ دەکاتەوە ف طوطی.

**توتیا:** دەرمانێکی چاوانە ف توتیا.

**توجاڕ:** مامڵەچی، تاجر، بازرگان ف بازرگان.

**توجی:** دابەش، بەش‌بەش کردن بەسەر خەڵکا ف توزیع.

**تۆچان:** بەروانکەیان پێش بەندێك تۆی تێدەکەن بۆ چاندن ف پیش‌بندی کە بذر در آن ریزند و می‌افشانند.

**توچان:** ١) تۆچان؛ ٢) فلێقانەوە ف ١) نگا: تۆچان؛ ٢) لە و پایمال شدن.

**توچانن:** ١) بەرپێ‌دان‌و فلێقاندنەوە؛ ٢) تۆم وەشاندن ف ١) لە کردن؛ ٢) بذرافشاندن.

**توچن:** ١) لیچْق؛ ٢) تۆم وەشێن ف ١) لزج؛ ٢) بذرافشان.

**توچێن:** تۆم وەشێن، تۆوچێن ف بذرافشان.

**توخ:** تۆز، غومار ف گرد، غبار.

**تۆخ:** ١) جوقـەی کڵاوی شاومیران؛ ٢) تام تیژی بەهـێز؛ ٣) تاریك رەنگ: (سوری **تۆخ**: سوری ئاماڵ ڕەش)؛ ٤) تێرگۆشت‌و قەڵەو ف ١) جُقّهٔ کُلاه شاهان؛ ٢) مزهٔ تند؛ ٣) رنگ سیر؛ ٤) چاق.

**توخس:** ۱) لەکەڵك کەوتە، بێ بەهرە؛ ۲) چەموش، بەیدەس ف ۱) از کار افتاده؛ ۲) چموش، رموك.

**توخم:** ۱) توم، تۆو؛ ۲) رەچەڵەك، بنەچەکە، نژاد ف ۱) تُخم؛ ۲) نژاد.

**تۆخماخ:** کوتەکی سەرزل، گۆپاڵ ف چُماق.

**توخمی:** فەحل، ئەسپ یا بەران یا هەرچی بۆ پەڕین ڕاگیرابێ ف گشن.

**تۆخن:** تخون ف نزدیك.

**توخوب:** تخوب، سنور ف مرز.

**تۆخەری:** جۆرێ گەمەی قاپێن، وازیەکە لە میچێندا ف نوعی بازی با قاپ.

**تودەرە:** چرگ، چێرگ، مێشەسی ف هوبره.

**تور:** لاڵەپەتە، کەسێ قسەی بەرەوانی بۆنایەت ف الْکَن.

**تۆر:** ۱) توربێن، تۆرەکەی نان و تێشو، خورجی بچوك؛ ۲) ترپ، تقر ف ۱) خُرجین؛ ۲) تُرُب.

**تۆڕ:** ۱) چنـــراوی بەگەو؛ ۲) چارەوای بارنـەکـراوی زین نەدیتـو؛ ۳) چەموش و بەیدەس؛ ۴) چەقەڵ؛ ۵) رەشکەو پێشکەی کە دێتە بەرچاو؛ ۶) ئەسپی لەگریوەغار جێماو ف ۱) توری؛ ۲) اسب رام نشده؛ ۳) رموك، چموش؛ ۴) شُغال؛ ۵) سیاهی رفتن چشم؛ ۶) اسب بازنده در مسابقه.

**تور:** هەلوك ف چوبِ کوچكِ الكدولك.

**تۆراخ:** ماستی ئاولێ گیراوی شویت تێکراو ف ماست کیسه.

**تۆراغ:** تۆراخ ف نگا: تۆراخ.

**تۆراغـدان:** ۱) دەفری تۆراغ؛ ۲) برێتی لەمرۆی زگ‌زل ف ۱) کیسهٔ ماست؛ ۲) کنایه از شکم گنده.

**تۆران:** زویر بون، زیزبون ف قهر کردن.

**تۆراندن:** تۆڕە کردن، قەڵس کردن ف رنجاندن.

**توراندن:** فو بە ئامرازی موسیقا یان کەڵەشاخدا کردن ف دمیدن.

**تۆراندن:** رەواندنەوە ف رمانیدن.

**تۆراندن:** فیراندن، زگ‌چونی ماڵات: (ئەم گوێلکە ئەتورێنێ) ف اسهال دام.

**تۆراو:** ڕەنجاو، زیز، زویر ف رنجیده، قهر کرده.

**توربێن:** تۆرەکە، تۆرك ف توبره.

**تورت:** ۱) تفت، ئاماڵ ترش و تاڵ؛ ۲) لاڵەپەتە؛ ۳) شتێ کە زود ەشکێ و زود ەپەڕێ ف ۱) گس مزه؛ ۲) اَلْکَنْ؛ ۳) تُرد.

**تۆرتو:** قەیچی، مقەس، مقەست ف قیچی.

**تۆرتورە:** سەرسواڵکەرە، چاو لەدەستی خەڵك ف گدامنش.

**تورتەماڵ:** خلیسك، شوێنی هەڵخلیسکان ف لیزگاه.

**تۆردان:** بەقەو هاویشتن، فرێدان ف پرت کردن.

**توررەهات:** قسەی بن شڕ و بێمانا ف حرف، بیخود.

**تورش:** ترش، مزر ف تُرش.

**تورشیات:** ترشیات، ئەوشتانەی لەناو سرکەدا پەروەردە دەکرێن ف ترشیجات.

**تورشیاگ:** ترشاو، ماست و شیر و... هەڵگەراوی ترشبوگ ف تُرشیده.

**تورشیان:** ترشان، هەڵگەڕان ف ترشیدن.

**تۆرك:** ۱) تۆڵەکە، نانە حاجی لەگ‌لەگ؛ ۲) چەقەڵ ف ۱) پنیرك؛ ۲) شُغال.

**تۆرك:** تۆرەکەی چکۆلە، کیسە قوماشی گوشاد ف توبرهٔ کوچك.

**تۆرك:** تۆترك، دزی ف تمشك.

**تورکە:** زورکان، زەمینی بەکەندو لەندو خەت‌خەت ف زمین شیارشیار طبیعی.

**تورگەن:** ناوی زۆزانێکە لە کوردستان ف نام ییلاقی در کردستان.

**تورلی:** باڵدارێکی پچوکە لە چێشکە بچوکتر ف پرنده‌ای است شبیه به گنجشك.

**تۆرمتە:** باشوکە ف باشه.

**تورمە:** ۱) زیوی خالیس؛ ۲) جۆرێ شاڵی بەناوبانگ ف ۱) نقرهٔ سره؛ ۲) شال تُرمه.

**تۆرنتە:** تۆرمتە ف نگا: تۆرمتە.

**توروش:** زات، غیرەت: (توروش نەکر بێژێ، یانێ: نەی ویرا بیلێ) ف جرأت، شهامت.

**تورونتە:** مشك گرە، مەلێکی پچوکی ڕاوکەرە مشك دەگرێ ف مُرغکی است شکاری.

**تۆرە:** ۱) شەرم، حەیا، عەدەب؛ ۲) فرزەندی هەوێ؛ ۳) زانست ف ۱) آزرم؛ ۲) فرزند هوو؛ ۳) دانش.

**تۆرە:** ۱) مێورە، لکـــەدارمێو؛ ۲) ویژە، ئەدەبیات ف ۱) شاخهٔ تاك که می برند؛ ۲) ادبیّات.

**تۆڕە:** رك‌هەستای، رق‌هەڵستاو ف خشمناك.

**تۆرەڤان:** زانا ف عالم، دانشمند.

**تورەقی** پایەبەرز بونەوە ف ترقّی.

**تۆرەکانە:** باجێ کەگزیر لەرایەتی دەستێنێ ف نوعی باج اربابی.

**تۆرەکە:** تۆرك ف توبره.

**تۆرەکەرێژ:** تەپۆڵکەی دەسکردی بنیادەم ف تپّهٔ دست‌ساز.

**تۆرەمە:** رەچەڵەك، بنەچەکە، نەژاد ف نژاد، نسل.

**تۆڕەوان:** راوکەری بەتۆڕ ف کسی که با تور شکار کند.

**تۆرەوان:** وێژەوان، ئەدیب ف ادیب.

**تۆڕهەڵدان:** بەنهێم بۆ دور هاویشتن ف پرتاب کردن.

**تۆڕەیی:** رك، رق، کینە، قەڵسی ف خشم.

**تۆڕی:** ۱) چەقەڵ، تۆرك؛ ۲) بێکارەو بێ نرخ: (خۆڕی و تۆڕی) ف ۱) شغال؛ ۲) آدم پوچ و بی‌ارزش.

**تۆرین:** زیزبون، زویر بون، تۆران، قەڵس بون ف قهر کردن.

**تۆرینۆك:** هەمیشە تۆڕەو دڵناسك ف عصبانی و زودرنج.

**تۆز:** ۱) متربە، موتوربە، پەیوەندی دار؛ ۲) کۆزەڵە، کۆز؛ ۳) چرچ لابەر، جل سافکەر، ئوتو یان هەرچی؛ ۴) داغ؛ ۵) خلیسك؛ ۶) لکی تازەی دار؛ ۷) بیچم وقەڵافەت ف ۱) پیوند درخت؛ ۲) ترتیزك آبی؛ ۳) اتو؛ ۴) داغ؛ ۵) لیزی؛ ۶) جوانه درخت؛ ۷) ریخت و قیافه.

**تۆز:** ۱) کەمۆسکە، ئەندازەی زۆرکەم؛ ۲) بابردەڵەی خاك، غومار ف ۱)

بسیار کم؛ ۲) گردوغبار.

**تۆزاڵ:** کەمێکی زۆرکەم ف بسیار اندك.

**تۆزان:** ئێش و برژانی پێست ف سوزش پوست.

**تۆزاندن:** داغ پێوەنان، ئاسنی سورەوەبو پێدا چزاندن ف داغ کردن.

**تۆزانەوە:** برژانەوەو سوزیانەوەی برین یان پێست ف سوزش و درد.

**تۆزاوی:** تۆزلێ نیشتو، گەرداوی ف گردآلود.

**تۆزقاڵ:** کەمترین ئەندازە، تۆزولکە، نەختۆکە ف کمترین مقدار.

**تۆزك:** تەرەتۆرە، تەرەتیزە ف ترتیزك.

**تۆزکاڵ:** تۆزقاڵ ف کمترین مقدار.

**تۆزکردن:** متوربەکردن، پەیوەند کردن ف پیوند زدن.

**تۆزکردن:** ۱) غومار هەڵکردن، تۆزهەستاندن؛ ۲) بریتی لە ئاژاوە نانەوە ف ۱) برانگیختن غبار؛ ۲) کنایە از آشوب برپا کردن.

**تۆزلانە:** تۆزقاڵ ف نگا: تۆزقاڵ.

**تۆزلقان:** تۆزقاڵ ف نگا: تۆزقاڵ.

**تۆزلێ هەڵنەسان:** بریتی لە چروکی ورزدی ف کنایە از خست.

**تۆزولکە:** تۆزقاڵ ف اندك.

**تۆزەلە:** چوزەلە، دوزەلە ف مزمار.

**تۆزیان:** ۱) برژان و ژانی پێست و زام؛ ۲) خلیسکان ف ۱) سوزش؛ ۲) لغزیدن.

**تۆزیانەوە:** برژانەوەی پێست و زام، چوزیانەوە، چوزانەوە ف احساس سوزش.

**تۆزین:** تۆزاوی، خوڵاوی ف غبارآلود.

**تۆژ:** ۱) تیژ لە برین‌دا؛ ۲) تیژ لە چێژەدا؛ ۳) تۆی هەرەناسکی شیر یان برین یان هەرچی ف ۱) و ۲) تیز در برش و در مزە؛ ۳) کاشە.

**تۆژاڵ:** تویژاڵ، تویژاڵك، تۆژ ف کاشە.

**تۆژك:** تۆژاڵ ف کاشە.

**تۆژگ:** کێرد یا خەنجەر ف دشنە، خنجر.

**تۆژەر:** کەسێ کە بە بنج و بناوانی باسێ یا کارێکا دەڕوا، کوڵەرەوە ف پژوهشگر.

**تۆژی:** دابەش، بڵاوکردنەوە بەناودا ف پخش کردن.

**تۆژی:** ۱) برندەیی تیغ؛ ۲) چێژەی تیژوتون ف ۱) تیزی تیغ؛ ۲) تیزی مزە.

**تۆس:** گیای تیسوێ، تۆسی ف گیاهی است.

**تۆسقاڵ:** تۆزقاڵ ف کمترین مقدار.

**تۆسکاڵ:** تۆزقاڵ ف نگا: تۆزقاڵ.

**تۆسن:** سەرکێش، نارام ف اسب سرکش و رام نشده.

**تۆسی:** تێسو، تیسوێ، تسوێ ف گیاهی است خاردار.

**تۆش:** ۱) روبەرو بەیەك گەیشتن؛ ۲) هەوای زۆر ساردو بارانی؛ ۳) چارەوای کازگر و لەقە هاوێژ؛ ۴) مرۆی بەدفەڕو بێ ئاکار ف ۱) با هم روبرو شدن؛ ۲) هوای سرد و بارانی؛ ۳) اسب چموش؛ ۴) آدم موذی و بداخلاق.

**تۆشاڵ:** تۆژاڵ ف نگا: تۆژاڵ.

**تۆش بون:** ۱) روبەڕوبون، تێك ئاڵقان؛ ۲) گرفتاربون بە کارێکەوە ف ۱) روبەروشدن؛ ۲) گرفتار شدن.

**تۆشتیر:** چوێشتیر، بزنی بەرتەگە، تێشتیر ف بزغالهٔ دوساله.

**تۆشك:** ۱) تۆژاڵ؛ ۲) کێردو خەنجەر؛ ۳) سەختی سەرما ف ۱) نگا: تۆژاڵ؛ ۲) کارد و خنجر؛ ۳) سرمای سخت.

**تۆشك:** تێشو ف توشە.

**تۆشکردن:** ۱) گیرۆدە کردن: (مەیخانە پەرست نەبوم و **تۆشت کردم** / بەو پیریە بەرەو پیری ئەوینت بردم) «خیام»؛ ۲) روبەرو کردن: (**توشت کردم** بەتوشی ئەو رەزاگرانەوە)؛ ۳) ناخۆش کردنی هەوا: (هەواکەی **توشکرد**) ف ۱) گرفتار کردن؛ ۲) روبرو کردن؛ ۳) منقلب شدن هوا.

**تۆشڵ:** تێخوڵ، تویکڵ ف پوست، پوستە.

**تۆشماڵ:** ۱) سەرپەرستی خێزان؛ ۲) گزیر، کوێخا ف ۱) سرپرست خانوادە؛ ۲) کدخدا.

**تۆشە:** ۱) زاد، زەواد؛ ۲) بژیوی سەفەر ف ۱) آذوقە؛ ۲) توشهٔ سفر.

**تۆشهاتن:** ۱) روبەروبون؛ ۲) گرفتار و گیرۆدە بون ف ۱) روبرو شدن؛ ۲) گرفتار شدن.

**تۆشەبەرە:** توربێنی تۆشە راگوێزان ف خرج، توشەدان.

**تۆشی:** ۱) جنگنی و بەدفەڕی؛ ۲) ساردی و بارانی بونی هەوا ف ۱) ستیزەجوئی؛ ۲) سرد و بارانی بودن هوا.

**توشیار:** ۱) گیرۆدە؛ ۲) روبەروبون ف ۱) دچار؛ ۲) روبرو شدن.

**تۆف:** ۱) هەڕەت، جەنگە، تاف؛ ۲) کرێوە و باپێچ؛ ۳) وارشی باغ و بێستان، شوڕە ف ۱) موسم، عنفوان؛ ۲) کولاك؛ ۳) دیوار دورباغ و بستان.

**تۆفلە:** خونچەی گەڵادار ف جوانە برگ درخت.

**تۆفال:** تڵیشەی تەنك لەمس کە لە کوتاندا دەوەرێ ف تکەهای نازك و باریك از مس کە در مسگری بەجای ماند.

**تۆفاڵ:** خلتە ف تفالە.

**تۆفان:** ۱) ڕوژی زۆر توش و بەکرێوە؛ ۲) لافاوەکەی نوحی پێغەمبەر ف ۱) کولاك؛ ۲) طوفان نوح.

**تۆفانە:** پێشکە ف پشە.

**تۆفك:** دانەی بۆدان و برژاندن لەسەر ساج ف دانەای کە آنرا بو دهند.

**تۆفل:** تۆکڵ، تێخوڵ ف قشر، پوستە.

**تۆفە:** ۱) کرێوەو باپێچ؛ ۲) چینەی دیوار لەقوڕ ف ۱) کولاك؛ ۲) چین دیوار گلی.

**تۆفیر:** فەرق، جیاوازی ف فرق، توفیر.

**تۆڤ:** ۱) تۆم، تۆو؛ ۲) جۆر: (**چتوڤ:** چلۆن) ف ۱) بذر، تخم؛ ۲) طور.

**تۆق:** ۱) ئاڵقە، گەو، قەف؛ ۲) تەپڵەسەر، بڵندترین جێگە لە هەرشتێ: (بەردێکی لە **تۆقی** سەرم دا)، (چیا لە **تۆقە** سەری دادژاوە تا کەمەری) «حاجی قادر»؛ ۳) ملەوانەی یەکپارچە لە زێڕ ف ۱) حلقە؛ ۲) بالاترین نقطە؛ ۳) گردن‌بند زرین.

**تۆقا:** ۱) تەقیەوە: (باروتەکە **تۆقا**)؛ ۲) مرد لەترسان ف ۱) منفجر شد؛ ۲) زهرە‌ترك شد.

**تۆقان:** ۱) تەقینەوە؛ ۲) لەترسان مردن؛ ۲) کۆمەڵە ئاڵقە ف ۱) انفجار؛ ۲) زهرەترك شدن؛ ۳) حلقەهای آهنی.

**تۆقاندن:** ۱) تەقاندن، ترەکاندن؛ ۲) ترساندن ف ۱) منفجر کردن؛ ۲) ترساندن.

**تۆق‌تۆقە:** فیشەکە شیتە، ئەو تەقەمەنیەی کە منداڵ لەجەژنا بەکاری دێنن ف فشفشه.

**تۆق تۆقیلە:** گیایەکە بەرەکەی ناو بەتاڵە. بەدەست دیگوشن *تەقەی دێ* ف گیاهی است.

**تۆق کردن:** ماندوبون‌و وەستانی منداڵ لە گریان ف خستەشدن کودك از گریه.

**تۆقلە:** پۆرك، زیپکەی پڕئاو ف تاول.

**تۆقلە کردن:** پۆرگ کردن ف تاول زدن.

**تۆقـەسـەر:** بڵنـدتـرین جێ، بەرزایی هەرەبەرز؛ ۲) تەپڵی سەر ف ۱) بالاترین نقطه؛ ۲) تارك.

**تۆقیان:** لەترسان مردن ف زهرەترك شدن.

**تۆقین:** ۱) تۆقیان؛ ۲) ترەکان ف ۱) از ترس زهرەترك شدن؛ ۲) منفجرشدن.

**تووك:** ۱) کوڵکـە، مو، وردەپـەڕی مەل؛ ۲) ئاکار، ئەخلاق‌و رەوشت؛ ۳) شادی بە دەمـاغی؛ ۴) دوعـای شەڕ، نزای خراپ؛ ۵) نووك، سەری باریکـی شیش‌و دەرزی‌و...؛ ۶) باڵـداریکـی شەوبـێدارە؛ ۷) کەم، بەدەگمەن: (تاك‌وتووك پەیدا دەبێ) ف ۱) پَر، مو؛ ۲) روش واخلاق؛ ۳) شادی و سرحـالی؛ ۴) دعـای شرّ، نفـرین؛ ۵) نُك تیزِ هر چیز؛ ۶) پرندەای است؛ ۷) اندك، کم.

**تۆك:** تێکوڵی دار ف پوست درخت.

**توکـانن:** ۱) هێلکـە بەدنـدوك شکاندن، تروکاندن؛ ۲) ئەزمونی هێلکە بەددان ف ۱) شکستن تخم‌مرغ با منقار؛ ۲) آزمودن تخم‌مرغ با دندان.

**تووك‌رونـی:** بـریتی لەکەیف سـازی‌و خۆش رابواردن ف کنایه از خوش گذرانی.

**توك کردن:** ۱) وردەپەڕ لێهاتنی جوجەڵە؛ ۲) دوعای خراپ کردن ف ۱) پر درآوردن جوجه؛ ۲) نفرین.

**تۆکڵ:** تۆفل، تویکڵ، تێکوڵ ف قِشر، پوسته.

**تۆکمە:** ۱) پیاوی تێك سمراوی پتەو؛ ۲) هەرشتی ناوپڕی قایم ف ۱) آدمِ قدکوتاهِ چاق و نیرومند؛ ۲) هر چیز میان‌پُر و محکم

**تۆکمەچی:** شیرگەر، وەستای چەکسازی ف اسلحەساز.

**تووکن:** زۆربەمو، زۆر بەتووك، کوڵکن، بەکوڵکە ف پرمو، پشمالو.

**تووکنە:** ۱) توکن؛ ۲) جوجەڵەی هێشتا پەڕ دەرنەکردو ف ۱) پشمالو؛ ۲) جوجۀ پر در نیاورده.

**تووکە:** ۱) کلوه بەفر؛ ۲) وردە باران ف ۱) دانۀ برف؛ ۲) نم‌نم باران.

**تووکەبەر:** موی بەرگەدە ف موی زهار، عانه.

**تووکەتووك:** نم‌نمە، بارینی هێدی هێدی ف نم‌نم باریدن.

**تووکەسەر:** ۱) پوڕ، موی سەر؛ ۲) بریتی لە رك‌هەستاو ف ۱) موی سر؛ ۲) کنایه از خشمگین.

**تووکەی سمێڵ:** بزەی شادی: (هێندە بەکەیفە **تووکەی** سمێڵی دێت) ف کنایه از شادمانی.

**تۆڵ:** پیزە، پڕ، ساوای ناوزگ، بێچوی هێشتا نەزاو ف جنین.

**تۆڵ:** ۱) حەیف، تۆڵە، قەرەبوی زوڵم ساندنەوە؛ ۲) مەزبوت؛ لەش سوك. *دوای وشەی توند دێت*: (توندو **تۆڵ**) ف ۱) انتقام؛ ۲) فِرز و چابُك.

**توول:** ۱) پارچـەی زۆر تەنـك‌و ناسـك؛ ۲) لکی ناسکی دارو گیا؛ ۳) درێژایی: (لە **توولی** عومرمدا) ف ۱) وال؛ ۲) جوانه؛ ۳) طول.

**تووڵ:** شووڵ، شوو، لکی باریك ف تَرکه.

**تۆلا:** پێکەوە نوسان‌و رەق بوونی زۆرشتی ورد: (**تۆلا** گەزۆ) ف چَگال.

**تۆلاز:** لاوی چاولە وەڕێن‌و ژنباز، هەرزە کاری دڵدار ف جوان شهوت‌ران و هرزه.

**تۆلازی:** حەز لەژنان کردن، چاولە وەڕێنی، نەزەربازی ف چشم‌چرانی.

**تۆلاش:** تیزمالك، تلیش ف پلمۀ چوب و سنگ.

**تولانـەوە:** لەبـەر زۆرکـوڵین لەبـەریەك چون: (گۆشتەکە هێند کوڵیوە **تولاوەتەوە**) ف در اثر پختن زیاد از هم پاشیدن.

**تولینەوە:** تولانەوە ف نگا: تولانەوە.

**توولبڕ:** بریتی لە خۆ گێل کردن‌و خۆ دزینەوە ف خود را به کوچۀ علی‌چپ زدن.

**تولح:** سەرەتای رۆژ: (**تولحی** بەیانی لە ماڵ دەرکەوتم) ف طلوع.

**تولـخ:** ۱) رەشی ئاماڵ خۆڵەمێشی؛ ۲) رەنگی رەشی ئاماڵ زەرد ف ۱) سیاه مایل به خاکستری؛ ۲) سیاه مایل به زرد.

**تولخی:** جۆرێ ترێ ف نوعی انگور.

**تۆل دان:** وێران کردن ف ویران کردن.

**تۆلك:** تۆلکە، تۆلەکە، نانەحاجی لەگ‌لەگ ف پنیرك.

**تولکێش:** لکی نەبڕاوی داری مێو ژێرخاك کردن ف جوانۀ درخت مو را زیر خاك کردن.

**توولنج:** جینچك، تروشکان، هەڵتوتەکان ف چمباتمه.

**تولوم:** تەپڵ ف طبل.

**توولە:** ۱) لکی زۆرناسکی یەکساڵە؛ ۲) نانە حاجی لەگ‌لەگ؛ ۳) سەگی چکۆڵە؛ ۴) بەچکەمار؛ ۵) ماری باریك ف ۱) جوانه نازك؛ ۲) پنیرك؛ ۳) سگ کوچك شکاری، یوز؛ ۴) بچۀ مار؛ ۵) مار باریك.

**تولە:** سەگی چکۆڵەی ڕاو، قەندی ف یوز، سگ شکاری کوچك.

**تۆڵە:** تۆڵ، حەیف ف انتقام.

**تولەپلنگ:** تاژپلنگ، هاس ف یوزپلنگ.

**تولەترش:** مـام رێـواس. *گیایەکە دەرمانی کرمە* ف گیاهی است ضد انگل.

**تۆلەدانە:** چێشتی تۆڕك‌و دانەوێڵە ف آش پنیرك و حبوب.

**توولەرێ:** رچە، رێگەی باریك لە چیاوچۆل ف راه باریك در کوه.

**توولـەزەرە:** رێزەڵە، گیـایەکە دەخـورێ ف تاج‌ریزی، گیاهی است خوردنی.

**توولەسەوز:** گیایەکە بەرەکەی لەگوێژ دەکاو بەرزە بالایە ف گیاهی است

بلند که ثمرش شبیه زالزالك است.

**تۆڵەك:** ١) وەرینی موی لەش: (ریوی گەزیزە خواردو **تۆڵەك** دەکا)؛ ٢) بریتی لە تازەلاوی بێ‌موو ف ١) ریزش مو و کُرك؛ ٢) کنایه از جوان سادەرو.

**تۆڵەکە:** تۆڕك، نانە حاجی لەگ‌لەگ ف گیاه پنیرك.

**تۆڵەمار:** ١) ماری باریك؛ ٢) بەچکەمار ف ١) مار باریك؛ ٢) بچّه مار.

**تۆڵە نەمام:** ریشەداری باریك و ڕاست و بەرزەبالا ف نونهال باریك و بلند.

**تۆڵی سەوز:** تۆڵە سەوز ف نگا: تۆڵە سەوز.

**تۆلینە:** قەرتاڵەی زۆر چکۆڵە ف سبدك طاس‌مانند.

**توم:** گرمە، هاڕە ف صدای بلند و مهیب.

**تۆم:** تۆو، تۆڤ، تۆ ف تُخم، بذر.

**تۆماتێز:** تەماتە، باجاناسوّر ف گوجه‌فرنگی.

**تۆمار:** ١) قاقەزی نوسراوی لول‌دراو؛ ٢) نوسین لەدەفتەرا ف ١) تومار؛ ٢) ثبت در دفتر.

**تۆمارکردن:** نوسین لە دەفتەردا ف ثبت در دفتر.

**تۆماو:** شاوەت، ئاوی‌پشت ف منی.

**تۆمپــز:** سەرمــەقــلات، چقڵمبــە، بەلینگــەو قوچی خۆ هەڵگێڕانــەوە، سەرمەقولات ف پُشتك.

**تومتموك:** والایی بن گاشەبەرد ف فراخی زیر صخره.

**تۆم رژیاگ:** لە پیاوەتی کەفتگ ف اخته‌شده.

**تۆمك:** چەشــە، چەشتــە، چێشتــە، خۆراکی فریودانی نێچیر ف طُعمهٔ شکار.

**تومێن:** گرماندن، هاڕەکردن ف نعره زدن.

**تۆمو:** دەرپێ ف تُنبان.

**تۆمە:** ١) توم، تۆڤ؛ ٢) ڕەچەڵەك و تایەفە ف ١) تُخم؛ ٢) نژاد.

**تۆمەز:** بەبڕوام، وا گومان دەکرێ، تمەز ف تونگو.

**تۆمەزا:** تۆمەز ف تونگو.

**تۆمەرز:** تۆمەز ف تونگو.

**تۆمەرۆ:** ڕەگی ئاوی شاوەت ف مجرای مَنی.

**تۆمەس:** تۆمەز ف تونگو.

**تومەك:** دنبەك، دمەك، دومەڵەك ف تُنبك.

**تۆمەڵێ:** تۆمەز، تۆمەس ف تونگو.

**تون:** ١) قایم؛ ٢) تام‌تیژ ف ١) مُحکم؛ ٢) تُندمزّه.

**تۆن:** ١) ئاگردانی گەرماو؛ ٢) جەهەننەم: (نایکەی بە **تۆن**) ف ١) گلخن، تون گرمابه؛ ٢) جهنّم.

**تونـا:** فەوتـاو، نەمـاو، لەبـەین‌چو. *دوای وشەی تەفر دێت*: (دەك یاخوا تەفر و تونا بێت) ف نابود.

**تۆنـاوتـۆن:** بەیەکجـاری فەوتـان و ئاسـەوار نەمان: (ئەی زاڵم! یاخوا **تۆناوتۆن چی**) ف بەیکباره از بین رفتن.

**تونج:** برنج، برنجە، کانزایەکە زەرد ف فلز برنج.

**تونجك:** توالێت، کاکۆڵی سەر توێڵ ف کاکُل.

**تۆنچی:** ئاگرکەری ئاگردانی گەرماو ف تونتاب، آتش‌انداز.

**تۆنخانە:** ئاگردانی گەرماو ف گلخن، تون حمام.

**تونـد:** ١) قایم، مەحکـەم؛ ٢) چێژە تیژ؛ ٣) بەرانبـەری نەرم: (توتنێکی **تونـدە**)؛ ۴) چاپك و چالاك؛ ۵) پەلە، لەز، عەجەلە ف ١) مُحکم؛ ٢) تُندمزه؛ ٣) تلخ و گرم؛ ۴) چست و چالاك؛ ۵) عجله و شتاب.

**توندبۆن:** تووڕەبوون: (پیسم لێ **توندبۆ**) ف عصبانی شدن.

**توندبۆنەوە:** ڕەق بونەوەی شل، لەدوای شلی خۆ گرتنەوە ف سِفت شدن.

**توندگرتن:** باش های لێ بۆن ف محکم گرفتن.

**توندوتۆڵ:** مەزبوت ف چُست و چالاك.

**توندوتیژ:** بەزاکۆن، گوناه نەبەخش ف سختگیر.

**توندە:** چێشتی بەرامبەری شلە: (**توندە** ساوارم خوارد) ف غذای سِفت.

**توندەمیجاز:** هەمیشە تووڕە ف عصبانی.

**توندی:** ١) نەشلی، سفتی؛ ٢) چالاکی؛ ٣) تووڕەیی؛ ۴) تونی، تیژی؛ ۵) گەرمی لە چێژەو دوکـەڵدا: (توتنێ **توندە**) ف ١) سفتی؛ ٢) زیرکی، چالاکی؛ ٣) عصبانیّت؛ ۴) تیزی و تندی؛ ۵) تندی و گرمی در مزه.

**تۆنك:** تفنك، لوت، کەپۆ ف بینی.

**تونگ:** ١) دەفری مل‌باریك بۆ تراو، تونگە؛ ٢) توند ف ١) تُنگ؛ ٢) تُند.

**تونگە:** دەفری ئاوی مل‌باریك ف تُنگ.

**تونە:** هەرنیە، هیچ نیە ف وجود ندارد.

**تۆنەك:** تنۆك ف نگا: تنۆك.

**تۆنی:** تینگ، تینو، ئاتاجی ئاوخواردنەوە ف تشنه.

**تۆو:** تۆ، تۆم ف تُخم، بذر.

**تۆوتکاو:** لەپیاوەتی کەوتوو ف مردی که توان جنسی را از دست داده.

**تۆورژاو:** تۆوتکاو ف نگا: تۆوتکاو.

**تۆەخۆرە:** خەزایی، عەینەمەل ف سار ملخ‌خوار.

**تۆەڕەشە:** گاتو، شاتو ف شاه‌توت.

**تۆەسۆرە:** گاتو ف شاه‌توت.

**توێ:** ١) پارچــەی تەنــك لەگۆشت، لەتی ناسکی گۆشت؛ ٢) تاقــەت و تابشت: (تاو **توێم** نەماوە)؛ ٣) ئێش و ژان: (تاوتوێی برینەکەیە گیانم دێشێ) ف ١) شرحه؛ ٢) تاب و توان؛ ٣) درد و اَلَم.

**تۆی:** زەماوەند، بەزم و داوەتی بوك هێنان. *ئەم وشەیە ترکیش دەیڵێن* ف جشن عروسی.

**تۆیانــە:** نوغـڵ و شیرینی کە دەگەڵ جیازی بوکـا دەینێرن ف نقـل و شیرینی همراه جهیزیه.

**توێتکە:** ئۆقرە، ئارام، سوکنا ف آرام و قرار.

**توێتکەخواردن:** داسەکنین، ئۆقرەگرتن ف آرام گرفتن.

**توێ‌توێ:** ١) پارچـەپـارچەی ناسکی گۆشت؛ ٢) وشەیەکە مانگادۆش بۆمانگای دەڵێ تا بۆدوشین ڕاوەستێ ف ١) شرحه‌شرحه؛ ٢) لفظی که گاودوش با گاو گوید.

**توێخ:** ١) تۆژاڵ؛ ٢) تۆژك، پەتـرۆك، پەردەی هەرەناسکی سەر شیر یان سەر برین ف ١) کاشه؛ ٢) چرابه.

**تویخڵ:** تێکول، تۆکل ف قشر، پوسته.

**تۆیر:** ١) تورت، ئەوی زو بشکێو بپەڕێ؛ ٢) کیسەی قوماش، تورەکە؛ ٣) ترپ، تفر ف ١) ترد، شکننده؛ ٢) کیسهٔ پارچه‌ای؛ ٣) تُرُب.

**تۆیری:** چەقەڵ ف شُغال.

**توێری:** تۆیری، چەقەڵ ف شغال.

**تویرشه:** ١) بەرو بوخچەی حەمام؛ ٢) جێگەی خۆ جوان کردنو خشڵو زیڕ ف ١) بُقچهٔ حمام؛ ٢) آرایشگاه و محل زینت‌آلات.

**تویز:** کوزەڵە، گیای کوز ف جرجیر.

**تویزەڵە:** کوزەڵە ف جرجیر.

**توێژ:** ١) توێخ؛ ٢) تێژ لە بڕینا؛ ٣) تێژ لە چێژەدا ف ١) کاشه؛ ٢) تیز؛ ٣) تُندمزه.

**توێژاڵ:** تۆژاڵ ف کاشه.

**توێژگرتن:** پەردەی ناسك هاتنە سەر شیر یان برین ف کاشه‌بستن.

**تویس:** تۆسی ف گیاهی خاردار.

**تویسو:** تۆسی ف گیاهی است خاردار.

**توێسو:** تۆسی ف نگا: تۆسی.

**توێسی:** تۆسی ف نگا: تۆسی.

**توێشتیر:** توشتیر ف بُزغالهٔ مادهٔ دوساله.

**توێشو:** نانو زادی ڕێگە ف توشه.

**توێشوبەرە:** تۆشەبەرە ف توشه‌دان.

**توێشودان:** ئەو پەڕۆ یا هەنبانەی تێشوی تێدا ف توشه‌دان.

**توێشوکردن:** ئامادە کردنی توێشو بۆ سەفەر ف توشه آماده کردن.

**توێشه:** تێشو، تۆشه ف توشه.

**تویك:** تێکول ف پوسته.

**توێك:** توێخ ف کاشه.

**توێکردن:** بەناسك هەڵبڕینی گۆشت: (بولبول کە گەرمی نەغمەیە ئاگر دەکاتەوە / خونچە حەزینە، جەرگو دڵی بۆ دەکا **توێ**) «نالی» ف شَرحه کردن، بریدن به لایه‌های نازك.

**توێکڵ:** تێخوڵ، تۆکڵ، تۆفل، توێخڵ ف قشر، پوسته.

**توێڵ:** ئەنی، هەنیە، ناوچاوان، جەمین ف پیشانی، جبین.

**تۆیل:** تۆڵ، شوڵك، شوڵك، لکەداری باریکی بڕاو ف تَرکه.

**توێڵاش:** تلاش، تۆلاشە، پارچەی تەنك لەدار ف تراشه.

**توێڵبەند:** هەنی پێچ، ئەنی بەند، پارچە قوماشێ کە بەناو چاواندا دێت ف پیشانی‌بند.

**توێن:** تاوێن، تاوێنەوە ف ذوب کننده.

**توێنەوە:** تاوێنەوە: (ئەم دەزگایە مس **توێنەوەیە**) ف ذوب کننده.

**توێلك:** ١) تێکوڵ؛ ٢) زڕەتو ف ١) پوسته؛ ٢) از انواع درخت توت.

**تە:** وشەی ڕوبەڕو، تۆ ف تو، ضمیر مُخاطب.

**تەب:** تا، یاو، گەرمای زیادی لەش ف تَب.

**تەبا:** ١) ئاشت، نێوان خۆش؛ ٢) دەگەڵ، ڕەگەڵ، پێڕا ف ١) آشت؛ ٢) با، همراهِ.

**تەباشیر:** گەچی نوسین ف گچ نوشتن.

**تەبایی:** ئاشتی، ئاسودەیی، دنیای بێ‌شەڕو کێشە ف آشتی، آسودگی، صُلح.

**تەباخ:** ١) مانگی هەشتەمی ڕۆمی؛ ٢) تەبەق، سینی ف ١) ماه اوت؛ ٢) سینی.

**تەباخچە:** قاوەسینی، سینی چکۆڵە ف کَشَف فنجان قهوه.

**تەبار:** بارست، رادە ف حجم.

**تەبارە:** ١) نێوان، لەمپەر، تیغە؛ ٢) بارست، تەبار؛ ٣) دەغڵی گەیشتوی نەدوراو؛ ٤) هەرزاڵ، پێڕك ف ١) حائل میان دو چیز؛ ٢) حجم؛ ٣) غلّهٔ رسیدهٔ درو نشده؛ ٤) جایی سکومانند در چادر.

**تەبانە:** بانگوش، باگردان، بانگردێن، باگوردێن ف بام‌غلتان.

**تەبت:** ئارامی، هێمنایەتی ف آرامش.

**تەبر:** تەور، بیور ف تبر.

**تەبغـــە:** ١) سەرانگـویلك، زبـڵدان؛ ٢) کۆمـای زبـڵو پەین ف ١) آشغالدان؛ ٢) تودهٔ زبل و پهن.

**تەبۆ:** گەنە، جانەوەرێکی بۆری پانکەڵەیە بەئاژەڵەوە دەنوسێ ف کَنه.

**تەبور:** شەنە، شەن ف افشون.

**تەبەتۆر:** جاڵ جاڵوکە، جوڵاتەنە ف عنکبوت.

**تەبەتە:** تەبەنە، دەرزی لێفە درون ف سوزن درشت لحافدوزی

**تەبەر:** کەللا، هەڵمات، مەڕمەڕ ف تیله.

**تەبـەرزە:** ١) جۆرێ خورمـا؛ ٢) جۆرێ ترێ ف ١) نوعی خرما؛ ٢) نوعی انگور.

**تەبەرزین:** تەوەرزین، چەکێ بو وەك تەور بەدەس سوارەوە ف تبر زین.

**تەبەش:** ئاژەڵی ناوچاوان چەرمگ ف دام پیشانی‌سفید.

**تەبـەق:** ١) تەبـەك، یاڵتەبەق، مەعجومەی لەدار؛ ٢) جۆرێ نەخۆشی سمی وڵاخی بەرزە؛ ٣) نهـوم، قات ف ١) سینی چوبی؛ ٢) نوعی بیماری سُم‌دام؛ ٣) اشکوب.

**تەبـەقە:** ١) نهۆم، قاتی خانو؛ ٢) نەخۆشی تەبەق ف ١) اشکوب؛ ٢) نوعی بیماری سُم دام.

**تەبەقەتڕانە:** تاوان ساندن لە تڕکەن ف جریمهٔ گوزیدن.

**تەبەك:** ١) نەخۆشی تەبەق؛ ٢) تەشتی دارینی ناندێن؛ ٣) سینی دارین ف ١) نوعی بیمـاری سُم دام؛ ٢) تَشتِ چوبی نگهـداری نان: ٣) سینی چوبی.

**تەبەلیە:** قەڵماسك ئاسایەکی زلە بۆ چونەسەر دارخورما بەکاری دێنن ف وسیله‌ای فلاخن مانند که برای بالا رفتن از نخل از آن استفاده می‌شود.

**تەبەنە:** دەرزی درشت، دەرزی لێفەدرو ف سوزن لحاف‌دوزی.

**تەبیات:** ١) ئیشتیای خواردن؛ ٢) خۆرسك، تەبیعەت ف ١) اشتها؛ ٢) طبیعت.

**تەپ:** ١) تەمەڵ لە ڕێ‌ڕۆیشتن؛ ٢) گزی، گەڕ، حیلە؛ ٣) فێ، نەخۆشی فێداری؛ ٤) گرد، تەپـۆڵکە؛ ٥) کۆ، کۆما، کۆگا؛ ٦) سل، تۆپەڵەیەك گوی بنیادەم؛ ٧) هێرش؛ ٨) بێدەنگ، وس لەترسان؛ ٩) تۆز؛ ١٠) مژ ف ١) کُندرَو؛ ٢) سست؛ ٣) صرع؛ ٤) تپه؛ ٥) توده؛ ٦) توده‌ای از

فضلۀ آدمی؛ ۷) یورش؛ ۸) خاموش از ترس؛ ۹) غبار؛ ۱۰) مِه.

**تەپار:** ریخو قوڕ کە دەمی خەڵیفە مێشی پێ سواغ دەدەن ف سرگین و گِل که دهانۀ کندو را با آن اندایند.

**تەپارك:** تەپار ف نگا: تەپار.

**تەپاڵدان:** شوێنی تەپاڵە لێدانان، عەنباری تەپاڵە ف جای نگهداری تاپاله.

**تەپاڵە:** ریخی وشکەوەبو، شیاکەی وشك ف تاپاله.

**تەپاڵەپێژ:** ژنێ کە تەپاڵە بەدەست ڕێكوپێك دەکا ف زنی که سرگین را تاپاله کند.

**تەپـان:** ۱) ژێردەرانە، پاژنەی دەرگا؛ ۲) داری جێگەی تەوەرەئاش؛ ۳) تێڵای گەڵاکوتان؛ ۴) چەپەری پشتیوانەی دەرگا؛ ۵) بەردی قورسایی سەر دینـگ ف ۱) پاشنـۀ در؛ ۲) چوب زیرِ قُطب آسیا؛ ۳) چمـاق برگ‌کوبی؛ ۴) پشتوانۀ در؛ ۵) سنگ بالای دَنگ شالی‌کوبی.

**تەپاندن:** ۱) شێلان بەلاقیان بەهەرچی؛ ۲) توش کردن؛ ۳) ئاخنین ف ۱) کوبیدن با پای و...؛ ۲) دچار کردن؛ ۳) آکندن.

**تەپانن:** تەپاندن ف نگا: تەپاندن.

**تەپانە:** دەرپێی کورت، تنۆکە ف تُنبان کوتاه.

**تەپاو:** ۱) شێلدراو بەلاق یا...؛ ۲) رمیاو، خەریکی رمیان ف ۱) با لگد یا با بیل کوبیده شده؛ ۲) فرو ریخته، در حال فروریختن.

**تەپاوتل:** بەملاو بەولادا کەوتن ف تلوتلو خوردن.

**تەپتەپ:** دەنگی تەپاندنەوە بەدەست یا بەقاچ ف تاپ‌تاپ.

**تەپتەپان:** تەپەتەپ کردن ف تاپ‌تاپ کردن.

**تەپتەپە:** دوچەرخەی بەماتۆر ف موتورسیکلت.

**تەپ چێور:** تەکمیش، بن‌کۆڵ کردنی زرعات‌و دار ف پی زدن و سُست کردن خاك درخت و...

**تەپخ:** داتەپیو، تەپاو ف دیوار نزدیك به فرو ریختن.

**تەپخ‌بون:** داڕوخان، داتەپین ف ریزش کردن دیوار.

**تەپخ کردن:** ڕوخاندن، رماندن ف ویران کردن.

**تەپدان:** ۱) بەسەریەکا کۆمەڵ کردن؛ ۲) پەلاماردان ف ۱) انباشتن؛ ۲) یورش بردن.

**تەپڕەش:** فێڵباز، گەڕباز، حیلەساز ف ناروزَن.

**تەپس:** ۱) شێلان بەپێ؛ ۲) تەپین، داکـەوتنی دیوارو... ف ۱) لگدمال کردن؛ ۲) ریختن آوار.

**تەپسە:** داتەپین، روخان ف فروریختن.

**تەپسـی:** دەفری پانو گوشـاد بۆ چێـشت تێ‌کردن ف بُشقاب غذاخوری.

**تەپش:** داتەپان، تەپان ف نگا: تەپان.

**تەپشت:** کۆششت، تەقالا ف سعی و کوشش.

**تەپشو:** تەشوێ ف تیشه.

**تەپشوێ:** تەشوێ ف تیشه.

**تەپك:** ۱) دەوە، تەپاڵەی ژن شێلاویەتی؛ ۲) جۆرێ داوی ڕاو؛ ۳) جۆرێ تەڵە؛ ۴) گردولکە ف ۱) تاپاله؛ ۲) نوعی دامِ شکاری؛ ۳) نوعی تله؛ ۴) تپه.

**تەپ کردن:** بێدەنگ بون لەترسان ف خاموش شدن از ترس.

**تەپکە:** ۱) داوی لەتەختە کوتراو بۆ ڕاوی مەل؛ ۲) تەڵە لەدو داری سەر قوڵکە بۆ ڕاوی کەروێشك؛ ۳) دەوە، تەپاڵە؛ ۴) پنجەگیا، بنەگیا ف ۱) نوعی دام؛ ۲) نوعی تله؛ ۳) تاپاله؛ ۴) بوته.

**تەپل:** شوێن پەنجە، جێ‌قامك ف اثر انگشت.

**تەپڵ:** ۱) دەهۆڵی لەشکر؛ ۲) بانی سەر ف ۱) طبل؛ ۲) تارك.

**تەپڵژەن:** دەهۆڵ لێدەر ف طبّال.

**تەپڵك:** ۱) زگدانی دیوار؛ ۲) تەپڵی بچـوك؛ ۳) بەرکـەندال؛ ۴) ئاسنی گەوکردنەوەی شتی شکاو ف ۱) برآمدگی دیوار؛ ۲) طبل کوچك؛ ۳) آبکند؛ ۴) بند، پاره‌ای از آهن یا روی که بدان ظرف شکسته را پیوند دهند.

**تەپلمۆس:** تەمەڵو تەوەزەل ف بیکاره و سُست.

**تەپڵۆس:** تەپ، تەمەڵ، لەش‌گران ف تنبل و گرانجان.

**تەپلە:** ۱) کڵاوی لبـاد؛ ۲) جۆرێ کڵاوی ژنانە ف ۱) کلاه نمدی؛ ۲) نوعی کُلاه زنانه.

**تەپڵە:** کەلارە، دەفری لەشیاکە ف ظرف از سرگین.

**تەپڵەســـەر:** تۆقـەسـەر، تەوقی سەر، بەرزتـرین شوێن لە هەرشتێ ف بلندترین نقطۀ هر چیز.

**تەپڵەقو:** دارێکی لێڕەوارە لەبەلاڵوکە کێویلە دەکا ف درختی است جنگلی.

**تەپڵەك:** ۱) دەپی سەرکـوڵـەکەو بن‌میچ؛ ۲) تەپەکڵاو؛ ۳) تاس کڵاوی ژنـان؛ ۴) دەفـری ژێر سیغار؛ ۵) کورسیلەی شت لەسەر دانان؛ ۶) بانی گڵەبـان نەکـراو ف ۱) تخته‌پارۀ میان ستون و سقف؛ ۲) دایرۀ وسط عرقچین؛ ۳) نوعی کلاه زنانه؛ ۴) زیرسیگاری؛ ۵) عسلی؛ ۶) بامِ کاه‌گل نشُده.

**تەپڵی باز:** تەپڵی بچوُك کەلەڕاوە بازا تەیکوتن ف نوعی طبل کوچك.

**تەپڵی تۆپێن:** گەمەیەکە منداڵو لاو دەیکەن ف نوعی بازی کودکان و نوجوانان.

**تەپڵی سەر:** تەپڵە سەر ف روی سر.

**تەپڵی گۆش:** پەردەی گوێ: (پۆسێ تەپڵی گۆش نەم کێشان کەم‌کەم) «مەولەوی» ف پردۀ گوش.

**تەپڵی گوێ:** تەپڵی گۆش ف پردۀ گوش.

**تەپۆ:** ۱) مێشوُلەی لاق‌و دندوك درێژ؛ ۲) لارومەت شۆڕی بێ‌ددان؛ ۳) نەفام‌و دەبەنگ ف ۱) نوعی پشه؛ ۲) گونەها فرورفته از بی‌دندانی؛ ۳) بی‌شعور.

**تەپوتـــل:** هەڵس‌و کەوت، مات‌بون‌و جولاّن پێکـەوە ف جَست‌وخیز، افتادن و برخاستن.

**تەپوتۆز:** تۆزو غومار ف گرد و غبار.

**تەپو توُمان:** ۱) تۆزو غومار؛ ۲) مژی داوەستاو ف ۱) گردو غبار؛ ۲) مه غلیظ و راکد.

**تەپوخ:** ڕەت بردن، هەڵەنگوتن، ساتمەکردن ف سِکندری.

**تەپو دوُمان:** مژی زۆری داوەستاو [ف] مه غلیظ راکد.

**تەپوکۆ:** تەپوتل [ف] نگا: تەپوتل.

**تەپۆکە:** گردولکە، تەپکی نەزۆر بلّند [ف] تپهٔ کم ارتفاع.

**تەپۆلکە:** تەپۆکە [ف] تپهٔ کوچك.

**تەپۆڵکە:** تەپۆکە [ف] تپهٔ کوچك.

**تەپومژ:** مژی بەقەوەت [ف] مه غلیظ.

**تەپۆنکە:** تەپۆکە [ف] تپهٔ کوچك.

**تەپونم:** باران و مژ پێکەوە [ف] هوای بارانی مه‌آلود.

**تەپە:** ١) دەنگی کەوتنی شتی نەرمی قورس؛ ٢) دەنگی پای بنیادەم؛ ٣) تەپڵەکی ئارەخچن؛ ٤) گرد، کێوی چکۆڵە [ف] ١) صدای افتادن شیئی نرم و سنگین؛ ٢) صدای پا؛ ٣) دایرهٔ وسط عَرَقچین؛ ٤) تپّه.

**تەپەتەپ:** تەپتەپ [ف] نگا: تەپتەپ.

**تەپـەتـڕە:** بریتی لە ساوای تازەپێ گرتو کە دەکەوێ و هەڵدەستێتەوە [ف] کنایه از نوپای اُفتان و خیزان.

**تەپەدان:** بەسەریەکا کردن و لەسەریەك هەڵچنین [ف] توده کردن و برهم انباشتن.

**تەپەدۆر:** زاربێنی شوشە لەداری نەرم [ف] چوب‌پنبه.

**تەپەدوکەڵ:** دوکەڵی زۆر [ف] دود زیاد.

**تەپەسەر:** سەرکۆنە، سەرزەنشت [ف] سرزنش.

**تەپـەکـڵاو:** ١) پارچەی تەپڵەسەر داپۆش لە ئارەخچن‌دا؛ ٢) تەختەی گرۆوەر لەسـەر چەڵاکـی خێوەت و رەشـمـاڵ [ف] ١) دایرهٔ وسط عرقچین؛ ٢) کُلاهك ستون چادر.

**تەپەلۆك:** تەپاڵەی پێژراو [ف] تاپاله.

**تەپیان:** رمان، بەسەریەکا هاتنی دیوار [ف] فروریختن دیوار.

**تەپین:** ١) روخان، بەسەریەکا هاتنە خواری دیوار، تەپیان؛ ٢) داتەپین، نەوی‌بون و قوپانی‌شت [ف] ١) ریزش دیوار؛ ٢) فرورفتگی.

**تەپیو:** روخاو، رمیاگ [ف] ریزش کرده.

**تهتاوك:** نەعناکێوێلکە [ف] نعناع کوهی.

**تەترەك:** تەرزە، تەزرە، تەیروك [ف] تگرك.

**تەتك:** ١) لەپك، دەسکێش؛ ٢) سمت و ساتان [ف] ١) دستکش؛ ٢) باسن.

**تەتڵەمیران:** کرمێکە ئەستور دورێژ پای هەس، رەش وسپی‌یە [ف] کرمی است کُرك‌دار.

**تەتن:** قوڕ، حەڕی، هەڕ [ف] گِل.

**تەتـە:** ١) بوُکەڵەی منالاًن لەقوڕ یان لە هەویر؛ ٢) پوُر، خوشکی باوك، مەت، پلە؛ ٣) خێشـك بۆ زەوی لوس‌کردن [ف] ١) عروسـك گِلی یا خمیری؛ ٢) عمّه؛ ٣) بَزَن.

**تەتـەر:** ١) شاتـر، پیاوی بەپێ؛ ٢) کەسێ نامـە دەبـاو دێنێ [ف] ١) سریع‌السیر؛ ٢) نامه‌بر.

**تەتەری:** سماق، ترشی سماق [ف] سُماق.

**تەتەشۆر:** تاتەشوار، جێگەی مردو لەکاتی شۆردن [ف] سنگ یا تخته مُرده‌شوری.

**تەتەڵە:** ١) پارچە تەختە یان پارچە بەردی پانکەڵە بۆ لەسەر نوسین؛ ٢) نێوان ران و مۆغـەرەپشت، کەمـەر لە پشتـەوە؛ ٣) رومەت و لاجانگ پێکـەوە؛ ٤) پاك کردنی دەغڵ و توتن بەهەڵتەکاندن [ف] ١) لوح؛ ٢) کمر؛ ٣) گونه، رُخسار؛ ٤) بوجاری.

**تەتەڵەکردن:** ١) هەڵتەکاندنی دەغڵ و توتن بۆ پاك‌بونەوە؛ ٢) هەڵەکردن لەقسەداو زمان تێکەڵ‌بون؛ ٣) بەهەڵە چون لە نیشانە ئەنگاوتندا [ف] ١) بوجاری؛ ٢) زبان به تته‌پته افتادن؛ ٣) به‌هدف نزدن.

**تەتەڵەمیران:** ١) تەتڵەمیران؛ ٢) گاڵتەو گەمە [ف] ١) کرم کُرك‌دار؛ ٢) شوخی.

**تەتی:** ١) سمت و ساتان؛ ٢) ئاودەس [ف] ١) باسن؛ ٢) مستراح.

**تەجە:** تەگە، نێرەبزن، سابرێن، ساورێن [ف] نهاز، پیشرو گله.

**تەجەنەر:** تەگە [ف] نهاز.

**تەجیر:** تامان، تەیمان، دیواری لەشوُڵ، چەپەر [ف] پەرچین.

**تەجیری:** هیزە، خیگ، خیگە، پێستە [ف] خیگ.

**تەح:** وشەی سەیرمان [ف] حرف تَعَجُّب.

**تەحا:** تەح [ف] حرف تَعَجُّب.

**تەحام:** خواردەمەنی، شیو [ف] خوراك.

**تەحامات:** خواردەمەنی جۆربەجۆرو رەنگاورەنگ [ف] خوراکیهای رنگارنگ.

**تەحت:** ١) شاخ، کێوی لەبـەردی لوس و بڵند؛ ٢) لباد، نمد [ف] ١) کوه سنگی؛ ٢) نمد گُستردنی.

**تەحتەقاپـو:** ئاوایی نشین، بەرانبـەری چۆلپـەرست و کۆچەری [ف] تخته‌قاپو.

**تەحتیل:** وچان، رۆژی پشودان، بەتاڵی، بێکاری [ف] تعطیل.

**تەححا:** وشەی سەیرمان و سەرسوڕمان [ف] کلمهٔ تَعَجُّب.

**تەحر:** ١) تەرز، شێوە؛ ٢) بیچم [ف] ١) طرز، شیوه؛ ٢) سیما.

**تەحرە:** جەنگەی گەرمای نیوەڕۆ [ف] گرمای نیمروز.

**تەحس:** خلیسك، شەمت [ف] لیز.

**تەحسین:** خلیسکان، شەمتین [ف] لغزیدن، لیز خوردن.

**تەحفیل:** بیسمیل، خاوێن بونـەوەی پیس بەشـوشتن [ف] شُستن و پاك کردن. نجس.

**تەحل:** تاڵ، تار، بەرانبەری شیرین [ف] تلخ.

**تەحڵك:** ١) تاڵکـە، جۆرێ گژکـە کە هەتـا کاڵـە تاڵـە؛ ٢) رەش تاڵە، ئەسمەری ئاماڵ ڕەش [ف] ١) نوعی گرمك؛ ٢) سیه‌فام.

**تەحلەسیڤ:** گوژالك، کاڵەکە مارانە [ف] هندوانهٔ ابوجهل.

**تەحلی:** ١) چێژەی تاڵی؛ ٢) تاڵیشکە، گیای کەوان [ف] ١) تلخی؛ ٢) نام گیاهی است.

**تەحلیشك:** ١) تاڵیشکە؛ ٢) ئاوی تاڵ و سوێر [ف] ١) نگا: تاڵیشکە؛ ٢) آب تلخ و شور.

**تەحین:** دۆشاى کونجی، شیرەی کونجی، راشی [ف] شیرهٔ کنجد.

**تەخ:** دەنگی گەڕاندنەوەی گاجوت لەسەر خەت [ف] حرفِ هدایتِ گاوِ شخم‌زن.

**تەخار:** کێش و پێوانـەیەکی دەغڵە. *لەمـوکـوریان چوار تەنـەکەیە، لە کوردستانی عیراق ۶۴ تەنەکەیە* ف واحدی برای وزن غلّه.

**تەخاراو:** کوپەی زەلامی سەرئاواڵە بۆ دەفری ئاو ف تغار آب.

**تەخت:** ١) گوڕ، ڕێك، بێ‌کەنـــدو کلۆ و ڕاست؛ ٢) چارپـایەی لەسـەر نوستن؛ ٣) کورسی لەسـەر دانیشتنی پاشا؛ ۴) بێ‌خوار و خیچی ف ١) هموار؛ ٢) تختخواب؛ ٣) اریکهٔ سلطنت؛ ۴) بدون کجی.

**تەختان:** گوڕایی، هەردی ڕاست و تەخت ف زمین هموار.

**تەختانی:** تەختان ف زمین هموار.

**تەختایی:** تەختان ف زمین هموار.

**تەخت بون:** ڕاست‌بونی شوێنی بەکـەنـدو کلۆ، برێتی لە تێك ڕوخانی تەواو ف هموارشدن کندولند، کنایه از ویران شدن به‌کلی.

**تەخت‌ڕەوان:** کەژاوەی یەکچاوە کە بەچواردەستان هەڵدەگیرێ ف تخت روان.

**تەخت کردن:** ١) ڕاست کردنی زەوینی ناڕاست، برێتی لە وێران کردنی ئاوایی؛ ٢) خۆش و سازکـــردن: (کـەیفی خۆی **تەخت** کرد) ف ١) هموار کردن زمین، کنایه از ویران کردن؛ ٢) به آرزو رسیدن.

**تەختە:** ١) دەپ، داری پان تاشراو؛ ٢) پانایی و ڕاستی بەرد؛ ٣) پارچە لەکـوتاڵ یان لەکوێنی چادر؛ ۴) دوکانی داخراو: (دوکانەکەی **تەختە** کراوە، بازار **تەختەیە**)؛ ۵) تاوڵی، ئامرازی نەردێن لەسەر کردن ف ١) تختهٔ چوبی؛ ٢) تخته‌سنگ؛ ٣) تختهٔ قماش؛ ۴) دکان و بازار بسته؛ ۵) تخته‌نرد.

**تەختـەبـەن:** ١) کەت، تەختی لەتەختەو چوارگۆشەو گەورە بۆ لەسەر نوستنی هاوینان؛ ٢) محەجەری ف ١) کَت؛ ٢) نرده.

**تەختەبەند:** تەختەبەن ف نگا: تەختەبەن.

**تەختەپوت:** مۆرانەی دارخۆر، مۆریانە ف موریانه.

**تەختەپۆش:** ١) سەنگ پۆشی ئاوەڕۆ، نۆین؛ ٢) تەختەبەندی میچ ف ١) سنگ‌فرش آبراه؛ ٢) پروار، تخته‌هایی که سقف رابدان پوشند.

**تەختەدار:** دەپی دارین ف تخته.

**تەختـەڕەش:** دەپەڕەش، ئەوتەختەی ڕەش دەکرێ و لە فێرگە لەسەری دەنوسن ف تخته‌سیاه.

**تەختەساف:** کلاّفەدەزوی لەسەر پارچەمقەبا هەڵکراو ف قرقرهٔ مقوائی پهن.

**تەختەقـاپـو:** ئاوایی نشین، بەرانبـەری کۆچـەری چۆل پەرست ف تخته‌قاپو.

**تەختەقاپی:** تەختەقاپو ف تخته‌قاپو.

**تەختی ڕەوان:** تەخت ڕەوان ف تخت روان.

**تەخدەمە:** بەرکوت، دەغڵێ کەبەرلە درونە هێندێکی دەدرون وەدەیکوتن ف مقدار کمی از غلّه که برای آزمایش آنرا می‌کوبند.

**تەخسیر:** ١) لەش‌گرانی، تای‌سوك؛ ٢) ژنێ کەمێرد سەرجێی‌ی ناکا؛ ٣) کۆتایی، گوناح، هەڵە ف ١) کسالت؛ ٢) زن بی‌نصیب از همخوابگی شوهر؛ ٣) تقصیر.

**تەخش:** تیری هەواڵی کەوان ف تیر، سَهم.

**تەخشـان:** بڵاوکردن، دەگەڵ پەخشان تێژن: (ماڵەکەی هەموُ **تەخشان** پەخشان کرد) ف ریخت‌وپاش کردن.

**تەخشك:** ڕفحە، ڕفە ف طاقچه.

**تەخلیت:** ١) جۆر، تەرز؛ ٢) بەدەل، لەباتی عەسڵی ف ١) نوع، گونه؛ ٢) بَدَل.

**تەخمین:** بەراورد، لێکدانەوە ف حدس.

**تەخنـك:** قاپی گەورەی لەمس، سەعـەندی گەورە، لەگەنی چێشت ف ظرف بزرگ مسین.

**تەخەر:** بەشی زوربە، زۆرینە، زۆرتری ف اکثریت.

**تەڕ:** ١) شل، بەئاو، بەرانبەری زوها؛ ٢) وشەیەکە واتای زۆرباش دەدا: (تەڕم زانی)؛ ٣) واتای گاڵتە پێ‌کردن: (تەڕت نەزانی) ف ١) خیس، تر؛ ٢) بەمعنی خیلی خوب؛ ٣) کلمهٔ تَمَسْخُر.

**تەرا:** پاش *تاك* دێ، واتای تەنیاو چلۆنکایی دەدا: (تاك و **تەرا** لێرو لەوێ پەیدا دەبن) ف بعد از کلمهٔ *«تاك»* معنی مهجور و تنها می‌رساند.

**تەرابـون:** ١) لە بڵندەوە کەوتن؛ ٢) وێڵ بون، لەماڵ دورکەوتنەوە ف ١) پایین افتادن؛ ٢) مَهجور ماندن.

**تەرات:** ڕمبازی ئەسپ، هاتوچۆی ئەسپ لە مەیداندا ف جولان اسب در میدان.

**تەراتێن:** ڕمبازی، هاتوچۆکردنی ئەسب ف جولان اسب در میدان.

**تەراخۆمە:** نەخۆشیەکی چاوە ف تراخُما.

**تەڕاد:** ١) پێستی خالێکە، پێستی سەرکەلەکە؛ ٢) گۆشتی چەقاڵتە؛ ٣) تەرات ف ١) پوست تُهیگاه؛ ٢) غُدّهٔ گوشتی؛ ٣) نگا: تەرات.

**تەرار:** تاسولکەی ئاوخواردنەوە، زەرك ف طاس آبخوری.

**تەراز:** ١) ڕێك، بەرانبـەر؛ ٢) وەك، وێنە؛ ٣) ئامرازێکی بەنایانە، ڕێکی و بەرانبەری دیواری پێ بەراورد دەکەن ف ١) یکسان، تَراز؛ ٢) مانند؛ ٣) تراز بنّایی.

**تەڕازن:** تەڕەزن، مێرگی زۆر ئاودار ف چمنزار خیس.

**تەرازو:** ١) ئامـرازی کێشـانی دانـەوێڵەو میوە، تەرازی؛ ٢) کۆمـەڵـە ئەستێرەیەکە لە عاسمان ف ١) ترازو؛ ٢) بُرج میزان.

**تەرازوباز:** کەم‌فرۆش، کەسێ کە لە تەرازوکێشان فێڵ دەکاو کەم دەدا ف کم‌فُروش.

**تەرازومەند:** تەرازوراست، بێ فێڵ لە کێشاندا ف درست کار در وزن کردن.

**تەڕاش:** تڵیش ف تراشه.

**تەراش:** سەروڕێش چاك کردن ف اصلاح سر و صورت.

**تەراشتن:** تاشین، تراشین ف تراشیدن.

**تەراشین:** تاشین ف تراشیدن.

**تەراف:** ١) سمت و کەفـەڵی یەکسم؛ ٢) تەڕاد؛ ٣) مێوەرە ف ١) کَفَـل چهارپا؛ ٢) پوست و گوشت تُهیگاه؛ ٣) شاخه هَرَس شدنی تاك.

**تەرافکرن:** بڕینی ڕەز، باغ بڕین ف هَرَس کردن تاك.

**تەڕاڵ:** ١) تەمەڵ، تەپ، سست و بێکار؛ ٢) تەڕاد ف ١) تنبل، سُست؛ ٢) نگا: تەڕاد.

**تەڕاو:** ١) سواغی‌ماڵ بە گڵەسپی؛ ٢) نەماو ف ١) نوعی گچکاری؛ ٢) نابود.

**تەڕاوبەڕا:** هەڵلاداد، تێك‌وپێك ف هَرج و مَرج.

**تەڕایی:** بەئاوی، دژی وشکایی ف تَری، نمناکی.

**تەڕبون:** ١) شل‌بون، بەئاوبون؛ ٢) بریتی لە تەمێ بون‌و پەند وەرگرتن: (هێنــدە بێ‌بارە بەهیچ شتێ تەڕ نابێ) ف ١)خیس شدن؛ ٢) درس عبرت گرفتن.

**تەڕ بونەوە:** ١) حەیوان کە لە کاخواردن رزگار دەبێ‌و گیاشین دەخوا؛ ٢) بریتی لەو کەسانەی بەپیری ژن دێنن یا شودە‌کەن ف ١) حیوانی کە پس از گذراندن زمستان از گیاه و سبزهٔ تازە بچرد؛ ٢) کنایە از کسی کە در پیری همسر گیرد.

**تەڕبی:** دار بەلاڵوکە کێویلە ف درختِ آلبالوی کوهی.

**تەڕپل:** رەت، هەڵەنگوتن، ساتمەبردن ف سِکندری.

**تەڕپلین:** رەت بردن، هەڵەنگوتن، ساتمەبردن ف سکندری خوردن.

**تەڕپوش:** کەسێ جلکی‌باش دەبەر دەکا ف شیك‌پوش.

**تەڕپیر:** پیری دڵ زیندوی بەهەوەس ف پیرِ دل‌زندە.

**تەرت:** ١) بڵاو، پەرێشان، پەرژ؛ ٢) لەبەین‌چو، لەناودا نەماو؛ ٣) کەمرە، گەمڕە؛ ۴) بێشە، دەوەن ف ١) پراکندە؛ ٢) از میان رفتە؛ ٣) سرگین خشك شُدە؛ ۴) بیشە.

**تەرتوتونا:** هەرنەماو، لەبەین‌چو، فەوتاو بەیەکجاری ف تارومار، نابود.

**تەرتول:** کرمێکە ئافاتی گیاشین، کرمی سەوزی ف کرمِ آفت گیاهان.

**تەرجسە:** شین بونەوەی شوێنی لێدراو ف کبودی اثر ضربە.

**تەرجمان:** دیلمانج، وەرگێڕ، پاچڤەکەر ف مترجم.

**تەرجومە:** دیلمانجی، پاچڤە، وەرگێڕان ف ترجمە.

**تەرجەمە:** تەرجومە ف ترجمە.

**تەرچك:** شینکەی تەڕو تازە ف سبزهٔ شاداب.

**تەرح:** ١) بیچم، شکڵ‌و سەرو سەکوت؛ ٢) وەك، لەگوێن؛ ٣) قل، لق، لاسکی گیاو گوڵ ف ١) شکل و قیافە؛ ٢) شبیە؛ ٣) ساقهٔ گل و گیاە.

**تەرحەك:** جۆرێ دڕو، نەوعێ چقڵ ف نوعی خار.

**تەرحی:** جۆرێ سەرپۆشی ژنانە ف نوعی روسری.

**تەرخ:** وازهێنان، دەست هەڵگردن، تەرك ف تَرك کردن.

**تەرخان:** ئازاد لەباج‌و بەهرەی ئاغا ف مَعاف از مالیات و بهرهٔ مالکانە.

**تەرختە:** پشتەمازە، مۆغەرە ف مازە.

**تەرخون:** جۆرێ سەوزی خواردن ف ترخون.

**تەرداس:** تەورداس ف داس شاخەبُری.

**تەڕدەس:** ١) مەزبوت، چالاك؛ ٢) زو، لەز؛ ٣) دەس رەنگین‌و چازان ف ١) چابك؛ ٢) زود؛ ٣) ماهر، زَبَردَست.

**تەڕدەست:** تەڕدەس ف نگا: تەڕدەس.

**تەڕدەستی:** ١) چاپکی؛ ٢) لێزانی‌و دەسڕەنگینی ف ١) چالاکی؛ ٢) مهارت.

**تەڕدەم:** قسەزان‌و بەگفت‌ولفت ف سخن‌دان.

**تەرز:** ١) لکی داوە بەن ئاسای رەز؛ ٢) سەرلکی باریکی برکە بێستان؛ ٣) وەك، وەکو؛ ۴) جۆر، نەوع؛ ۵) جوان‌و لەبار ف ١) شاخە باریك و نخ مانندِ تاك؛ ٢) شاخ و برگ گیاهان پالیزی؛ ٣) مانند؛ ۴) نوع؛ ۵) زیبا و دلپسند.

**تەڕزمان:** تەڕدەم ف سخن‌دان.

**تەڕزوان:** تەڕدەم ف سخن‌دان.

**تەرزە:** تەیرۆك، گللێرە ف تگرگ.

**تەرزەشکێن:** تەرزەکوت ف نگا: تەرزەکوت.

**تەرزەکـوت:** دار یان زەرعـاتێکی تەرزە لێی دابێ ف میوە یا محصول زیان دیدە از تگرگ.

**تەرزەلۆکە:** گللێرکە، تەرزەی ورد ف تگرگِ ریز.

**تەرس:** گوی یەکسم ف پهن.

**تەرسە:** پێچەوانە، بەراوەژی ف برعکس، وارونە.

**تەرسەقول:** گوی کەر بەوشکی ف سرگینِ خُشکیدە اُلاغ.

**تەرش:** کەری، کەرك، کەرتکە ئاژەڵ ف بخشی از گلّە.

**تەرشداری:** مەڕداری، ئاژەڵداری ف گلەداری.

**تەڕقام:** خاوەن سەلیقە، بەزەوق ف خوش‌ذوق.

**تەرفك:** پارچە دەزو، داوەدەزو ف تکەنخ.

**تەرك:** ١) تەرخ؛ ٢) بەشی دواوەی زین کە هەگبەی لەسەر دادەبەستن؛ ٣) چەکی شەڕ ف ١) ترك؛ ٢) قسمتِ عقبی زین؛ ٣) اسلحە.

**تەرْك:** خشڵێکی ژنانە ف نوعی زیور.

**تەڕك:** ١) داردەستی ئەستور؛ ٢) ئێزنگی ئەستورو تەڕ؛ ٣) بریتی لەکێر ف ١) چماق؛ ٢) هیزم تر و کلفت؛ ٣) کنایە از آلت مرد.

**تەرکبەند:** بەن سامۆرتە ف ترکبند، فتراك.

**تەڕکردنەوە:** لەوەڕی سەوزدان بەماڵات دوای زستان ف دادنِ عَلَفِ سبز بەدام بعد از مدتی خوردن علف خُشك.

**تەرك کەوتـن:** ١) لەجـێ چونـی جوچکــە سمت؛ ٢) لەجێ چونی جومگەی پەلی ماڵاتی بەرزە ف ١) از جا در رفتن دنبالچە؛ ٢) از جا در رفتن مچ پای دام.

**تەرکە:** ١) شوُل، توُل، شولك؛ ٢) جۆرێ قامیشی ناوپڕ ف ١) ترکە؛ ٢) نوعی نی توپُر.

**تەرکەدنیا:** پیاوی چاکی دورەدنیا ف زاهد.

**تەرکی:** لای کەفەڵ لە زیندا، جێ خورج‌و هەگبەی سوار ف فتراك.

**تەرگ:** تەرزە، تەیرۆك، گللێرە ف تگرگ.

**تەرگژۆك:** تەرزە، تەیرۆك، گللێرە ف تگرگ.

**تەرگـە:** چارەکـەی کوڵ، کوڵـوانـە: (شیققـەی فدلـەکـول ئەتلەس‌و ئەستـونـەیی زەڕڕین / بێ بیکە بەتارای سەرو تەرگەی خەزو واڵا) «نالی» ف شنل.

**تەرگەوەڕ:** مەڵبەندێکە لە کوردستان ف نام بخشی از کردستان.

**تەڕلان:** ١) مەلـێکـی راوکــەرە لە تیرەی بازو شەهـێن؛ ٢) بریتـی لە جوان‌چاکی دلڕفێن ف ١) از پرندگان شکاری؛ ٢) کنایە از زیبای دلربا.

**تەڕلە:** گیایەکی دەشتە ئەخورێت ف گیاهی است خوردنی.

**تەرم:** ١) بنکـــۆڵی ڕەز، تەکمیش؛ ٢) جەنـــازە، لاشـە، جەنـدەك؛ ٣) حەوبـراله، حەوتەوانە، حەوت ئەستێرەن لەعاسمان ف ١) پی زدن و سست کردن خاك رز؛ ٢) جنازە؛ ٣) ستارگان هفت برادران.

**تەڕماڵ:** سمتی چارەوی، کەفەلّی یەکسم ف کَفل چارپا.

**تەرمێ نویحی:** ئەستێرەی حەوبرالە ف ستارۀ هفت برادران.

**تەڕن:** ١) فێڵباز، گەڕساز، دەس بڕ، زوان شڕ؛ ٢) بی فەڕ و بەئازار ف ١) ناروزن؛ ٢) مردم‌آزار.

**تەرنە:** چەمەڕایی، چاوەنوڕی، چاف نێری ف انتظار.

**تەڕنەبابیلە:** پەڕەسێلکە، پەڕەسلێرکە، حاجی ڕەشك ف پرستو.

**تەرو:** تێرو، تیروێ، دارێکـی دەوەنـــە بۆ بالـــوکـــە بنـی با دەدەن ف درختچەایست جنگلی.

**تەرواڵ:** ١) هەرزاڵ، پێڕك، سەکۆی لەدار لەڕەشماڵدا؛ ٢) رفحە، رفە ف ١) سکوی سیاه چادر؛ ٢) رف.

**تەرواڵە:** تەرواڵ ف نگا: تەرواڵ.

**تەڕوبڕ:** زۆرتەڕ ف بسیار خیس.

**تەڕوتازە:** شەق‌و تێراو، لەشۆق‌و تورت ف تر وتازە.

**تەڕوتوش:** هەوای پڕلە هەورو باران ف هوای بارانی.

**تەڕوتوشی:** دەمی پڕلە هەورو بارانی زۆر ف موسم بارندگی بسیار.

**تەروزی:** ترۆزی، ترێزو، چەمیلە، کالیاری فەریك‌و کاڵ ف خیارچنبر.

**تەروەتـدە:** ١) کەم وێنـە، هەڵکـەوتـە؛ ٢) نۆبـەرەی گوڵ‌و میوە ف ١) کم‌نظیر؛ ٢) نوبر.

**تەرە:** ١) ئەوقوڵکەی توتن یان میوەی تێدە کەن‌و بەگیا دای دەپوشن؛ ٢) لەلانە تۆراوی بە یەکجاری؛ ٣) برێتی لە ئاوارە ف ١) گودالی که میوه یا برگ توتـون در آن می‌گذارنـد و با گیاه می‌پوشـانند؛ ٢) از خانه رمیدن؛ ٣) کنایه از آواره.

**تەڕە:** ١) میوەی بێستان؛ ٢) کەوەر ف ١) میوۀ جالیزی؛ ٢) تره.

**تەڕەبار:** باری میوەی بێستان ف تره‌بار.

**تەڕەبەهار:** بەهاری زۆر پڕباران ف بهار پر بارش.

**تەڕەبیرۆ:** نەخۆشیەکی پێستە، سەودایی ف اگزمای پوستی.

**تەڕەپەنە:** گیایەکە ف گیاهی است.

**تەڕەپیاز:** پیازی شین، گەڵاپیازی ناسك ف پیازچه.

**تەڕەتورە:** ١) تەڕەتیزە؛ ٢) تۆڵەکە ف ١) شاهی؛ ٢) پنیرك.

**تەڕەتیزە:** تەڕەتورە ف شاهی.

**تەرەجە:** تاك، بەتەنیا ف یکه.

**تەرەدوا:** ١) تۆرانی یەکجـارەکی؛ ٢) دەرکردن بۆ همیشە ف ١) برای همیشه قهر کردن؛ ٢) برای همیشه اخراج کردن.

**تەرەدین:** پەتیارە، شێتۆکە، کەللەیی ف خُل.

**تەڕەزا:** حەیوانی تازەزاو ف حیوان تازه زاییده.

**تەرەزن:** تەڕازن ف نگا: تەڕازن.

**تەڕەزەن:** حەیوانی تازە زاوی زۆر شیردەر ف حیوان تازه زائیده بسیار شیرده.

**تەرەس:** بێ‌ناموس، خوێڕی ف پست و رذل.

**تەڕەساز:** شەلەمینی تەڕ، ترخێنە بەتەڕی ف آش شلغم و گندم.

**تەڕەساڵ:** ساڵی زۆر بە باران ف سال پُر بارش.

**تەڕەسلێمانە:** گیایەکە ف گیاهی است.

**تەڕەشوح:** ئاودەلاندن، رتو بەت، تمداری ف ترشُح.

**تەڕەشوع:** تەڕەشوح ف ترشُح.

**تەرەغە:** شاخێکی بەرزە لەموکوریان ف نامِ کوهی در منطقۀ مکریان کردستان.

**تەرەف:** لا، ئالی ف طرف، سو.

**تەرەقە:** چەشنی ف ترقه.

**تەرەقی:** بەرزتر بونەوە لەوباری هەیە ف تَرقّی.

**تەڕەکاری:** میوەی بێستان‌و سەوزیجاتی هاوینە ف محصولات جالیز.

**تەڕەکاڵ:** شێوکردنی زەوینی باران لێ‌باریو ف شخم زدنِ زمینِ باران خورده.

**تەرەکە:** جۆرێ قامیشی باریکی ناوپڕ ف نوعی نی باریك و توپُر.

**تەڕەماست:** ماستێ کە بۆزستان ڕادەگیرێ. پیوی بەسەردا دەکەن ف ماستی که برای زمستان نگهداری می‌شود.

**تەڕەمـاش:** ١) ماشی سەوز، ماش دەکەلودا؛ ٢) برێتی لەشتی نەهێژاو بێ‌نرخ ف ١) ماش سبز؛ ٢) کنایه از چیز بی‌ارزش.

**تەڕەماڵە:** ١) ماڵەکێشانی سواغ؛ ٢) دروێنەی بەلابڕ بێ سواڵە ف ١) اندودن؛ ٢) نوعی درو.

**تەڕەنداز:** تەڕپۆش ف شیك‌پوش.

**تەڕەوەز:** تۆچاندنی پاش باران ف تُخم‌افشانی پس از باران.

**تەرەوەژە:** مەلێکە، باڵدارێکە ف پرنده‌ایست.

**تەرەون:** تەرو ف نگا: تەرو.

**تەرەوەن:** تەرو ف نگا: تەرو.

**تەریان:** تریان ف سَبَدِ کوچك میوه.

**تەڕی:** بەرانبەری وشکی، ئاوداری ف تری.

**تەری:** ١) جوچکـــە سمت، کلێنچکـە، نێسکی قونێ؛ ٢) دوگ ف ١) دنبالچه؛ ٢) دنبه.

**تەریب:** درونی تەقەڵ درشتی قیچەڵفاچ ف دوختن با بخیۀ دُرُشتِ مورب.

**تەریبدان:** دورین بە تەقەڵی درشت بۆ قایمتر بون ف دوختن با بخیه بطور مورب برای مُحکم‌کاری.

**تەریدە:** چەتە، ڕێگر، گۆران ف راهزن.

**تەڕیزە:** خاڵیگە، کەلەکە ف تهیگاه.

**تەرێف:** پیس، گلاو، گەمار، کۆتی ف پلید، نجس.

**تەریق:** شەرمەزار، فهێت‌کار، خەجاڵەت ف خجل، شرمنده.

**تەرێق:** تەریق ف خِجل، شرمنده.

**تەریق بونەوە:** خەجاڵەت بون، بەشەرمدا کەوتن ف شرمنده بودن.

**تەرێق بونەوە:** تەریق بونەوە ف شرمنده شُدن.

**تەریقی:** شەرم کردن، خەجاڵەتباری ف خجالت کشیدن.

**تەرێقی:** تەریقی ف خجالت کشیدن.

۱) صخرهٔ صاف و مُرتَفَع؛ ۲) شتالنگ صاف شُده؛ ۳) بُرّا، تیز.

**تێشت:** تاشتی، نانی بەیانی، بەرقلیان ف چاشت.

**تێشــك:** ۱) تیرێژ، تیروژ، روناکایی خۆر؛ ۲) بریقەدانەوە؛ ۳) کوڵکەو موی درێژ، تیسك ف ۱) شُعاع پرتو؛ ۲) انعکاس پرتو؛ ۳) پَشم و موی زیاد.

**تێشکان:** بن کەوتن لەشەڕ یان لەسەوداو مامەڵەدا ف شکست خوردن، زیان دیدن.

**تێشکاندن:** سەرکەوتن لەشەڕ یان لەسەوداو مامەڵەدا ف شکست دادن، زیان رساندن.

**تێشکـاو:** ۱) ژێرکـەوتو لەشەڕدا؛ ۲) زەرەرلێ کەوتو لە سەوددادا ف ۱) شکست خورده؛ ۲) زیان دیده در معامله.

**تێشو:** بژیوی سەفەر، تۆشە ف توشه.

**تێشوبەرە:** ۱) نان بەری جوتیار بۆدەشت؛ ۲) تۆشەبەرە ف ۱) کسی که غذای دروگر را برایش می‌برد؛ ۲) توشه‌دان.

**تێشودان:** تۆشەدان، تۆشەبەرە ف توشه‌دان.

**تێشوك:** شتومەك، کەل‌پەل ف اثاث و لباس.

**تێشوکردن:** ۱) پێك هێنانی بژیو بۆ سەفەر؛ ۳) بریتی لە تێشت خواردن ف ۱) آماده کردن توشه؛ ۲) کنایه از صبحانه خوردن.

**تیشە:** ۱) تۆشە؛ ۲) رەگی تازە رواوی دەغڵ ف ۱) توشه؛ ۲) جوانهٔ تازهٔ گیاه.

**تێشە:** تۆشە ف توشه.

**تیشـــەبـڕ:** شەختـەیی کە دەخڵی شین هەڵـدەتـەکێنێ ف یخ‌زدنی که ساقه‌های سبز را می‌خشکاند.

**تیشەشاخ:** کەفری حولی‌و بڵند لەچیا، تیشەبەردی کێو ف صخرهٔ صاف و مُرتَفَع.

**تیشەلان:** بەردەلانی سەخت ف سنگلاخ صَعب‌العُبُور.

**تیشەمب:** گاتو، شاتو، توی‌رەش ف شاه‌توت.

**تێ‌شیشـان:** بە پەلـەپـەل خەریکی کارێك بون ف بەشتـاب مشغـول به‌کاری شدن.

**تیغ:** دەمەکێردو شیر و خەنجەر ف تیغ.

**تێغ:** تیغ ف تیغ.

**تیغـە:** دیواری تەنکی نێوانکەر، لەمەهری ناسك لەقوڕو بەرد ف حاجز دیواری، تیغه.

**تیغەشان:** ۱) ملەی کێو؛ ۲) لاشانی چیا، تیغە ف ۱) ستیغ کوه؛ ۲) تیغهٔ کوه.

**تیف:** ۱) لوس‌و لەبارو رێك لەبەرچاو؛ ۲) تنۆکە ئاو؛ ۳) دەنکە باران ف ۱) شیك؛ ۲) قطرهٔ آب؛ ۳) قطرهٔ باران.

**تیف‌تیفـە:** تیغ پێداهێنـانەوەی تاشراو: (سەرم تیف‌تیفە بدە)؛ ۲) خۆ جوان‌و لوس کردن: (واخۆی تیف‌تیفە داوە جحێڵان شێت دەکا) ف ۱) دوتیغه کردن؛ ۲) آراستن.

**تیف‌تیفەدان:** تیف‌تیفە ف نگا: تیف‌تیفه.

**تیفشاڵ:** توێژ، توێژاڵك ف کاشه.

**تیف:** گیزە، دەنگی گوللەی هاوێژراو ف صدای گلوله.

**تیفرگ:** چۆرەپۆپنە، چویلەکەیەکی کاکۆڵ بەسەرە ف شانه‌بسر.

**تیفسی:** بەلەمی چێشت، دەفری گراران، دەوری درێژوکەی گەورە ف دیس.

**تیڤل:** ۱) قسەی بەتێکوڵ، پلار، تیز؛ ۲) هیچ‌و پوچ‌و بێ نرخ؛ ۳) تێکوڵ ف ۱) حرف تودار؛ ۲) بی‌ارزش؛ ۳) پوسته، قشر.

**تیڤوك:** چێشکە، چۆلەکە، پاساری، مەلیچك ف گنجشك.

**تێ قوڵپاندن:** لەسەرەوە تێ‌رژاندن، تێدا قلپ کردنەوە ف از بالا ریختن.

**تیقە:** تریقە، دەنگی خەنین ف صدای خنده.

**تیقەل:** رزیوی دڕاو ف پوسیده و پاره.

**تیقەلۆ:** جل‌شڕ، شروڵ، بەرگ‌دڕاو ف ژنده‌پوش.

**تیك:** ۱) باقیە، تەقەڵ؛ ۲) درون، دورمان؛ ۳) تیشە شاخ ف ۱) بخیه؛ ۲) دوخت؛ ۳) صخرهٔ صاف و مرتفع.

**تێك:** ۱) گش، هەمو، ۲) دەناویەکدا؛ ۳) قیت، زۆپ ف ۱) همه؛ ۲) توی هم؛ ۳) قُد.

**تیکان:** دڕکی‌دار، دڕك، چقڵ ف خار.

**تێکبردن:** دەناویەکڕا کردن ف درهم فروکردن.

**تێکبەربون:** تێکەڵ بەیەك‌بون بۆشەڕ ف بەجان هم اُفتادن.

**تێکبەردان:** بەگژ یەکتردا کردن ف بەجان هم انداختن.

**تێکپەڕاندن:** دەپاڵ یەکترنانی دو یان چەندشت ف توی هم قرار دادن.

**تێکپەڕین:** چونەناویەکی چەندشت ف تداخُل اشیاء.

**تێکچون:** ۱) شێوان، لەبەریەك بڵاوبون؛ ۲) تورەبون، لەباری ئاسایی لادان ف ۱) آشُفتن؛ ۲) مُنقلب شُدن.

**تێکخران:** بەیەکترەوە بەستران ف بەهم بسته‌شدن.

**تێکخراو:** بەیەکەوە بەستراو، پێکەوە گرێ دراو ف بەهم بسته شُده.

**تێکخستن:** لێك قایم کردن، بەیەکەوە گرێدان ف بەهم گره زدن.

**تێکـدان:** ۱) خراپ کردن؛ ۲) تێکەڵ کردن؛ ۳) شێواندنی کار ف ۱) خراب کردن؛ ۲) قاطی کردن؛ ۳) بەهم زدن کار.

**تێکدەر:** ۱) وێرانکەر؛ ۲) کار خراپ‌کەر ف ۱) ویرانگر؛ ۲) آشوبگر.

**تێکڕا:** پێکەوە، گش، هەمی ف همه‌باهم، مجموعاً.

**تێکڕایی:** گش لەگش، سەرپاك ف همگانی، عمومی.

**تێ کردن:** ۱) دەناو رژاندن: (ئاوی تێکە)؛ ۲) سازدان: (سەبیل تێکە) ف ۱) ریختن توی؛ ۲) مُهیّا و آماده کردن.

**تێکسڕمان:** تێرگۆشتی‌و پتەوی ف چاق و قوی‌بنیه بودن.

**تێکسڕماو:** گیانداری تێرگۆشتی پتەو ف چاق و قوی بُنیه.

**تێکسمران:** تێکسڕمان ف چاق و قوی بنیه بودن.

**تێکسمراو:** تێکسڕماو ف چاق و قوی بُنیه.

**تێکشان:** رابردنی بەپەلە: (بڕەدا هات‌و تێکشا) ف عبور با شتاب.

**تێکشکان:** بەجارێ بەسەریەکدا وردبون‌و شکان ف یکباره در هم شکستن.

**تێکشکاندن:** وردو خاش کردن بەسەر یەکدا ف خُرد و خاش کردن.

**تێکشکاو:** بەسەریەکدا شکاو ف درهم شکسته.

**تێك كردنه‌وه:** بریتی له هه‌مو گیان شكاندن: (له‌شی **هه‌موتێك كرده‌وه**) ف كنایه از شكستن اعضای بدن در كتك كاری.

**تێك گیران:** ١) ده‌ناو یه‌ك ترنجان؛ ٢) بریتی له مل ده‌به‌رملی یه‌ك نان ف ١) درهم فروشدن؛ ٢) كنایه از گلاویز شدن.

**تیكله:** ١) به‌رۆشی پچوك، مه‌نجه‌ڵۆكه؛ ٢) جه‌ره‌ی ئاوكێشان ف ١) دیگ مسی كوچك؛ ٢) سبوی آبكشی.

**تێك لهه‌ڤ:** تێكڕایی، بێ‌هه‌ڵبژاردن ف درهم، بدون استثنا.

**تیكمه:** دوگمه، تۆكمه، قوپچه ف توكمه.

**تیكوبێك:** به‌جارێك خراوكراو، بێ‌سه‌ره‌وبه‌ره ف داغان.

**تێ كوتان:** خستنه‌ناوه‌وه به‌زۆر ف سپوختن.

**تێ كوتاندن:** تێ كوتان ف سپوزیدن.

**تێ كوتانن:** تێ كوتان ف سپوختن.

**تێ كۆشان:** ته‌قالا كردن، هه‌وڵدان ف كوشیدن.

**تێ كۆشین:** تێ كۆشان ف كوشش.

**تێ كوشین:** ١) تلیت، تریت، نان‌وڵین له شۆربـادا؛ ٢) دوغـرمـه، دوغورمه ف ١) ترید؛ ٢) سالاد ماست و نان خُشك.

**تیكه:** ١) له‌ت، پارچه له‌شتێك؛ ٢) بابۆڵه، له‌ففه؛ ٣) پارو ف ١) پاره؛ ٢) ساندویچ؛ ٣) لقمه.

**تێكه:** ده‌ناوی برژێنه: (چای **تێكه**، مێوژان **تێكه**) ف بر یز توی.

**تێك هالان:** تێك ئالۆزان، لێك هالان ف برهم پیچیدن.

**تیكه‌تیكه:** له‌ت‌له‌ت، پارچه‌پارچه ف تكه‌تكه.

**تێكه‌ڵ:** ته‌ڤ لهه‌ڤ، لێكدراو، ئاوێته ف درهم، آمیخته.

**تێكه‌ڵاو:** تێكه‌ڵ ف درهم، آمیخته.

**تێكـه‌ڵ بون:** ١) لێكدران، به‌ناو یه‌كدا چون؛ ٢) بریتی له جوت بون نێر و مێ ف ١) درهم آمیختن؛ ٢) كنایه از جفت‌گیری نر و ماده.

**تێكه‌ڵ پێكه‌ڵ:** بێ‌سه‌ره‌و به‌ره، هه‌ڵشێواو، شێواگ ف آشفته، درهم برهم.

**تێكـه‌ڵـدان:** ته‌ڤ لهه‌ڤ كرن، لێكدان به‌دار یان به كه‌وچك: (شیره‌كه **تێكه‌ڵ ده**) ف بهم زدن.

**تێكه‌ڵ كردن:** آویته كردن، لێكدان، آمیته كردن ف قاطی كردن.

**تێكه‌ڵ و پێكه‌ڵ:** نارێك، نه‌ته‌كوز ف نامرتّب.

**تێكه‌ڵه:** ورده به‌ردو ره‌ڵم پێكه‌وه ف مخلوط شن و ماسه.

**تێكـه‌ڵی:** ١) ته‌ڤ لهـه‌ڤی؛ ٢) ئاوێتـه‌یی؛ ٣) بریتی له دۆستـایه‌تی و خزمایه‌تی ف ١) آشفتگی؛ ٢) آمیختگی؛ ٣) كنایه از دوستی و خویشاوندی.

**تێكـه‌وتن:** ١) كه‌وتنـه ناوه‌وه؛ ٢) ژێركـه‌وتن‌و تێشكان له وازی‌دا؛ ٣) بریتی له‌مه‌له‌كردن بۆ لابردنی له‌ش پیسی؛ ٤) به‌هۆی نه‌زانینه‌وه تۆشی كارێك بون ف ١) افتادن توی؛ ٢) باختن در بازی؛ ٣) كنایه از غُسل؛ ٤) از روی بی‌اطّلاعی دست به‌كاری رفتن.

**تێكه‌ولێكه:** به‌رهه‌ڵدایی، بێ‌سه‌ره‌و به‌ره‌یی، كه‌س له‌كه‌سی ف بلبشو.

**تێكه‌وه‌دان:** به‌نارێكی و په‌رێشانی هاتن‌و چون ف پریشان قدم زدن.

**تێكه‌وه‌هاویشتن:** تێكه‌وه‌دان ف پریشان قدم زدن.

**تێك هه‌ڕستن:** به‌توندی پاڵ پێكه‌وه‌دان ف محكم به هم چسبیدن.

**تێك هه‌ژیان:** لێك هالان به‌بزوتنه‌وه ف بهم پریدن.

**تێك هه‌ڵچون:** پێك هه‌ڵپرژان و تێكه‌وه گلان بۆشه‌ڕ ف گلاویز شدن.

**تێك هه‌ڵـدان:** ١) شه‌ڕه‌شـه‌ق، به‌پێ له‌یه‌كـدان؛ ٢) شه‌ڕكردنی ئاژه‌ل به‌سه‌ر ف ١) لگد و تیپا زدن؛ ٢) شاخ به‌شاخ شدن حیوان.

**تێك هه‌ڵشێلان:** به‌ســه‌ریه‌كــدا هه‌ویركــردن، دو ده‌رمـان پێكـه‌وه تێكه‌ڵ كردن و شێلان ف درهم چلانیدن، معجون كردن.

**تێگڕا:** تێكڕا، گشت له‌گشت ف نگا: تێكڕا.

**تێگڕایی:** به‌گشتی، تێكڕایی ف عمومی، همگی.

**تێگـرتن:** ١) به‌ره‌ونیشانه هاویشتن؛ ٢) پینه به لیباسدا درون؛ ٣) به‌رد ده‌كون و جاده‌نان: (به‌ردی **تێ بگره**) ف ١) هدف گیری؛ ٢) پینه‌زدن؛ ٣) سنگ در سوراخ نهادن.

**تێگرماندن:** لێ‌خوڕین، تێ‌خوڕین ف نهیب زدن.

**تێگوشین:** تێكوشین، تێ‌وڵین، نان تلیت كردن ف ترید كردن.

**تێگه‌شتن:** حاڵی بون ف فهمیدن.

**تێگه‌یاندن:** حاڵی كردن ف فهماندن.

**تێگه‌یشتن:** فامین، حاڵی بون ف فهمیدن.

**تێگـه‌یشتـو:** فامیده، حاڵی بوگ: (خـوایه بۆمـان بنیری ئاوی له‌قوڕ نه‌نیشتـو / یان لاوی پێگه‌یشتو یان پیری تێگه‌یشتو) «وه‌هبی» ف فهمیده، دانا.

**تێگه‌یشتی:** تێگه‌یشتو ف فهمیده، دانا.

**تێگه‌ین:** فامین، حاڵی‌بون ف فهمیدن.

**تێگه‌یو:** فامیده، به‌زانست ف فهمیده، دانا.

**تێ گیران:** گیركردن له‌شتێكا، بێ ده‌ره‌تانی ف گیر كردن.

**تێگیركردن:** تێگیران ف گیرخوردن.

**تێگیریان:** تێگیران ف گیر كردن.

**تیل:** ١) ئامـاڵ‌خوار؛ ٢) ده‌رپـه‌ڕیو: (**تـیلی** كردوه باش دیاره)؛ ٣) قه‌ڵه‌مه‌داری تازه نێژراو؛ ٤) سوچ، قوژبن؛ ٥) خێل، خوێل؛ ٦) كه‌لا، هه‌ڵمات ف ١) كج، مایل؛ ٢) بارز، مُشخّص؛ ٣) قلمهٔ تازه كاشته؛ ٤) گوشه، زاویه؛ ٥) لوچ؛ ٦) تیله.

**تێل:** ١) هه‌ودای له‌مس‌و ئاسن، سیم؛ ٢) به‌رقییه، تێلگـراف؛ ٣) ئاماڵ خوار، تۆزێ لار؛ ٤) لوس، ساف ف ١) سیم؛ ٢) تلگـراف؛ ٣) كج، مایل؛ ٤) صاف.

**تێڵ:** توێڵ، هه‌نیه، ئه‌نی، ناوچاوان ف پیشانی.

**تیلا:** سوچ، گۆشه، قوژبن: (به **تیلای** چاوی لێ‌ڕوانیم) ف گوشه.

**تیلاّ:** دارده‌ستی ئه‌ستور، چۆماغ، په‌یاغ ف كدنگ.

**تیلاتـرێن:** داركـاری خه‌ست‌و خۆڵ: (كه‌وته‌گیانی **تیلاترێنی** كرد) ف به‌شدّت كُتك‌زدن.

**تیلاگ:** لاسه‌ر: (كڵاوی **به‌تیلاگی** سه‌ریه‌وه نابو) ف جانب سر.

**تیلاوتیل:** خواره‌خوار، له‌سه‌رلا ف كج و اریب.

**تیلایی چاو:** گۆشه‌ی چاو: (**تیلایی چاوی** دامێ) ف گوشهٔ چشم.

**تیلكردن:** ١) خوار كردنه‌وه؛ ٢) نیشاندان له‌لاوه ف ١) خم كردن؛ ٢) از

گوشه نشان دادن.

**تیلکه:** دیزەی چێشت ف دیزی.

**تیلماسك:** تیسماڵك، پارچەی باریك و درێژ ف نوار پارچه‌ای.

**تیلمه:** تیلماسك ف نوار پارچه‌ای.

**تیله:** ١) بێچوەسەگ توتکەکسوك، توڵە؛ ٢) سوچ، قوژبن؛ ٣) تیل، کەلا، هەڵمات ف ١) تولەسگ؛ ٢) گوشه؛ ٣) تیله.

**تێله:** تاڵە، رەش تاڵە، ئەسمەر، گەنم رەنگ ف گندمگون، سیه‌فام.

**تێلەکه:** کوڵ. کوڵەپشت ف کوله‌پشت.

**تێلەگه:** تێلەکه ف کوله‌پشت.

**تیلەمار:** ١) بەچکە مار، چێلی مار؛ ٢) ماری باریك ف ١) بچهٔ مار؛ ٢) مار باریك.

**تێلی:** ناوی پیاوانەیە ف اسم مردانه.

**تیلێن:** هەڵماتین، مەڕمەڕێن، کەلایین ف تیله‌بازی.

**تێم:** ١) لەسەردا؛ ٢) دەهێم، دێم. بەرانبەری دەڕۆم ف ١) از من؛ ٢) می‌آیم.

**تیماج:** پێستی ئاژەڵی خۆش کراوی دەباغ دراو ف میشن.

**تیمار:** ١) رنەك کردنی یەکسم، شاڵ و قاشاغ کێشان؛ ٢) خزمەت و ئاگاداری لە نەخۆش؛ ٣) گوندێکە لە کوردستان ف ١) شال کشیدن و تمیز کردن ستور؛ ٢) پرستاری و مراقبت؛ ٣) دهی در کردستان.

**تیمارخانه:** نەخۆشخانه، خەستەخانه ف بیمارستان.

**تیمارکەر:** ١) برین پێچ، یاریدەری حەکیم؛ ٢) خزمەتکاری نەخۆش؛ ٣) رنەك دەری یەکسم ف ١) پزشکیار؛ ٢) پرستار؛ ٣) مهتر اسب.

**تێمان:** ١) دامان، رامان، سەرگەردانی؛ ٢) دەناوماندا ف ١) سرگردانی و درماندگی؛ ٢) میان ما.

**تیمانج:** ١) تیماج، جۆرێ پێستەی تەنك؛ ٢) برشتی باریك لەچەرم ف ١) میشن؛ ٢) نوار چرمی.

**تێماو:** داماو ف درمانده.

**تیمچه:** قەیسەری، بازارۆکە لەبازاری گەورەدا ف تیمچه.

**تێمروکان:** تێو روکان، کۆ بونەوە بەدەوری شتێکا ف گِردآمدن.

**تێموم:** دەستنوێژکردن بەتۆز لەجیاتی ئاو ف تَیَمُّم.

**تێمیسك:** کرێژی لێو لە نۆبەتێوە ف تبخال.

**تین:** ١) هێز، وزە، تاقەت، تابشت؛ ٢) گەرمای تاو یان ئاگر؛ ٣) ئاگردانی گەرماو، تون؛ ٤) تینگ، تینو، تونی، تیهنی؛ ٥) بناغە، هیم ف ١) تاب و توان؛ ٢) گرمی خورشید یا آتش؛ ٣) گُلخن؛ ٤) تشنه؛ ٥) شالوده، اساس.

**تێن:** ١) لەنێمەدا، دمەدا: (تێن دایە دزی دەکا)؛ ٢) دێن، بەرانبەری دەڕۆن؛ ٣) تونی، تینگ؛ ٤) تین، گەرمای ئاگر ف ١) میان ما؛ ٢) می‌آیند؛ ٣) تشنه؛ ٤) حرارت و گرمای آتش.

**تێنان:** خستنەناو، ئێخستنە هوندور، لەدوڕنان ف گذاشتن تو ی.

**تێنشکی:** نەخۆشیەکە، نەخۆش هەرگیز تێراو نابێ، ئیسقایی ف استسقاء.

**تیشیر:** نیوەساردو گەرم، شیلەتێن، شیرتین، شیلەوگەرم ف ولَرم.

**تینك:** رایەڵی بو زو، راهەنگاوتەی شاڵ ف تارهای افقی در شالبافی.

**تینگ:** ١) ئالو، بادامەی لای مل، لوزەتێن؛ ٢) تُونی، تینو، تی ف ١) لوزتین؛ ٢) تشنه.

**تینگی:** تونیایەتی، ئاوخوازی بۆوە خواردن، تینیەتی ف تشنگی.

**تینو:** ١) تینگ، تی؛ ٢) گەرو، قورگ ف ١) تشنه؛ ٢) گلو.

**تینۆ:** بەیتێکی بەناوبانگی جەنگ‌نامە ف داستانی حماسی و مشهور.

**تینۆ:** تینگ، تینو ف تشنه.

**تینواتی:** تونیایەتی، تینگی ف تشنگی.

**تێنواره:** هەڵوەدا، ئاوارە، بێ‌ماڵ، رەبەن ف آواره.

**تینوارین:** تواشاکردن، لێ نهێرین ف تماشا کردن.

**تینوایەتی:** تونیەتی، تینگی، تینواتی ف تشنگی.

**تینوەتی:** تینواتی، تونەتی ف تشنگی.

**تینوێتی:** تینگی، تونیەتی ف تشنگی.

**تێنەوین:** داهاتنەوە بۆ هەڵگرتن ف خم شدن برای برداشتن بار.

**تینی:** ١) تینو، تینگ، تی؛ ٢) نەفەس خواردنەوەی بلوێر ژەن ف ١) تشنه؛ ٢) نفس زدن سُرناچی.

**تێ نیشتن:** ١) دەست بەکاری کردن؛ ٢) سواری جوڵانە بون، لەجوڵانە نیشتن ف ١) دست بکار شدن؛ ٢) در تاب نشستن.

**تیوتی:** ١) لە گوشەو کەنارەوە؛ ٢) رەت بردن بە هەردولادا ف ١) از گوشه و کنار؛ ٢) تلوتلو.

**تیوتیوه:** تیف تیفه ف نگا: تیف تیفه.

**تیوتیوەدان:** تیف تیفەدان ف نگا: تیف تیفه‌دان.

**تێ وروکان:** تێمروکان ف نگا: تێمروکان.

**تێ وشین:** تێکوشین، تێولین ف ترید نان.

**تیوڵ:** ناسك و تەنك. لەگەڵ تەنکا دەیلێن: (تەنك و **تیوڵە**) ف نازك و لطیف.

**تیوڵە:** ١) تەوێلە، تەویلە، پشتێر، گەوەڕ، گەوڕ؛ ٢) پۆ، تێوەدان ف ١) اصطبل؛ ٢) پود بافته.

**تێولین:** تێ گوشین، تلێت کردن ف ترید‌کردن.

**تێوه:** لەناویدا ف اندرونش.

**تێوەپێچان:** لێ هاڵاندن ف پیچیدن تو ی.

**تێوەچون:** ١) کەوتنە ناو شلی ناتەمیسەوە؛ ٢) پێوە نوسان ف ١) فرو شدن؛ ٢) آغشتن.

**تێوەدان:** ١) ئامێتەکردنی کەم بەزۆر؛ ٢) هەڵسوان، ساوین؛ ٣) ئالودە کردن: (خوی قوڕاوی بو، منیشی **تێوەدا**)؛ ٤) پۆ، هەواڵی رایەڵ؛ ٥) پۆ دەڕایەڵ هەڵکێشان ف ١) آمیختن کم با زیاد؛ ٢) ساییدن؛ ٣) آلودن؛ ٤) پود؛ ٥) پود در تار کشیدن.

**تێوەردان:** ١) تێك وەردان، لێکدان؛ ٢) ئاودەدەفر گەڕاندن بۆ خاوێنی: (ئاوێك دەوقاپە **وەردە**) ف ١) بهم زدن؛ ٢) آب در ظرف گردانیدن.

**تێوەژان:** نەقیزە تێ روکردن ف سیخونك زدن.

**تێوەژاندن:** نەقیزەلێدان ف سیخونك زدن.

**تێوەژەندن:** نەقیزەکوتان ف سیخونك زدن.

**تێوەشان:** راوەشاندنی جلك لە تەندوردا. بۆ مۆرانە کوشتن ف لباس بر آتش گرفتن.
**تێوەشاندن:** جلك بەئاگر راداشتن. بۆمۆرانە کوشتن ف لباس بر آتش گرفتن.
**تێوە کردن:** دەناو نان بەنهێم ف تپاندن.
**تێوە گلان:** توش بون بەکارێك لەخۆڕایی ف بی‌دلیل درگیر شُدن.
**تێوە گلاندن:** گیروەکردن بەبێ رازی بون ف بی اجازه درگیر کردن.
**تێوێل:** توێڵ، ئەنی، ناوچاوان ف پیشانی.
**تیە:** دیدە، چاو ف دیده، چشم.
**تیە :** تونی، تینگ ف تشنه.
**تێە :** وشەی سەیرمان، تەح، تەحا ف حرف تعجب.
**تێهاتن:** ۱) هاتنەناو؛ ۲) تێ رژان ف ۱) توآمدن؛ ۲) توریختن.
**تێهانین:** بەخت هێنان، هەل بۆ رەخسان ف شانس آوردن.
**تیهن:** تونی ف تشنه.
**تیهنی:** تونی ف تشنه.
**تێهەڵچون:** ۱) پێداچەقان: (دڕوێکم **تێهەڵچوە**)؛ ۲) چونەناو بۆ کارێك ف ۱) خلیدن؛ ۲) وارد کار شُدن.
**تێ هەڵچونەوە:** بەسەر گرتنەوە، سەرلەنوێ کردنەوە: (بەکوردی دیسان زینـدو دەبمـەوە / لەودنیاش بۆکورد **تێ هەڵدەچمەوە**) «هەژار» ف استیناف.
**تێ هەڵچەقان:** پێداچەقین: (دڕکێك دەقاچم **هەڵچەقا**) ف خلیدن.
**تێ هەڵچـەقاندن:** پێـدا چەقاندن: (دڕکێکی **تێ هەڵچەقاندم**) ف خلاندن
**تێ هەڵچەقین:** تێ هەڵچەقان ف خلیدن.
**تێهەڵدان:** ۱) دۆڵچە یان دەفر دەئاوڕا کردن بۆ ئاو هەڵێنجان؛ ۲) بەشەق لەیەکێك دان ف ۱) آب را با ظرف برکشیدن؛ ۲) تیپازدن.
**تێ هەڵساوین:** پیامالین، پێداساوین ف مالیدن، اندودن.
**تێ هەڵسون:** پیامالین، تێ هەڵساوین ف اندودن، مالیدن.
**تێ هەڵقوتان:** لاپرەسەنی، لەخۆوە خۆ دەکارگەیاندن ف فضولی.
**تێ هەڵکردن:** بەقەو دەنگ هەڵێنان لەگۆرانی ف آواز سردادن.
**تێ هەڵکـەوتن:** بەتـاسەوە مژ لەمەمکی دایك‌دان ف با اشتیاق مُك به پستان مادر زدن.
**تێ هەڵکێش:** ۱) خستنـەنـاو یەکتـر؛ ۲) شیعـرێك دەنـاو شیعـری بێگانەیەکدا ف ۱) لا گذاشتن؛ ۲) بین اشعار شعر دیگری را آوردن.
**تێ هەڵکێشـــان:** ۱) داو یا هەرشتێ دەنـــاو شتێ خرێ: (ئـەم داوەی **تێ هەڵکێشـە**)؛ ۲) دەنـاو تراونـان و هێنـانـەوە: (ئـەوە ئاوە دەستە پیسەکەتی **تێ هەڵکێشە**) ف ۱) لاگذاشتن؛ ۲) غوطەور کردن و درآوردن.
**تێ هەڵـەنگان:** تێ هەڵەنگوتن، توش بونی شتێك و ساتمە پێ بردن ف سکندری خوردن.
**تێ هەڵەنگوتن:** ۱) تێ هەڵەنگان؛ ۲) لەپڕ توش بون ف ۱) سکندری خوردن؛ ۲) ناگهانی برخورد کردن.
**تێ هەڵێنان:** پڕکردنەوەی زیان، قەرەبو دانەوە ف تلافی کردن.
**تێ هێنان:** سەرکەوتن لەکارێکا، هەل رەخسان ف موفق شُدن.

**جا:** ١) جێگە، جێ؛ ٢) کەوابو، کەوایە: (**جابابێ، جا بابڕوا**)؛ ٣) ئیتر، لە ئاکاما: (**جا** چیتان کرد)؛ ٤) ئەوسا، ئەوعانە: (بائەو بڕواجا وەرە بۆلامان)؛ ٥) پلەو دەرەجە: (پیاگێ **جادارە**)؛ ٦) جێگەو بان، نوێن: (نەخۆشە لەجادا کەفتوە) ف ١) جای؛ ٢) پس؛ ٣) در نتیجە؛ ٤) آنگاه؛ ٥) پایە و مقام؛ ٦) رختخواب، بستر.

**جائاستە:** بەجێ ماو، جێماو، دواکەوتو ف جاماندە.

**جاب:** جواو، پەرسڤ ف پاسُخ.

**جات:** پاشگری کۆیە. *تایبەتی* بۆ میوەو سەوزی دەگوترێ: (**میوەجات**، **سەوزیجات**) ف پسوند جمع.

**جاترە:** نەعنا کێو یلکە ف مَرزهٔ کوهی.

**جاتەنە:** جاڵ جاڵوکە، جوڵاتەنە، کاکڵە موشان ف عنکبوت.

**جاجر:** هەڵوایەکە لە کاکڵە گوێزو هەنگوین دەکرێ ف خوراکی از عسل و گردو.

**جاجك:** بنێشت، بەنوشت، شیلەی دارەبەن ف سَقّز.

**جاجکەتاڵە:** شیلەی دارەبەن کە هێشتا نەکولێندراوە، بنێشتە تاڵ ف سقزِ تلخ.

**جاجکە خۆشە:** شیرەی دارقەزوانی کوڵ پێدراو، بنێشتە خۆشە ف سقزِ شیرین.

**جاجگ:** جاجك ف سَقّز.

**جاجم:** مەوج، تەنراوێکە لەخوری، نوێنی تێوە دەپێچن ف جاجیم.

**جاجیك:** کاهو ی هەنجناو لەناو ماستدا ف سالاد ماست و کاهو.

**جاچك:** جاجك ف سَقّز.

**جاچکە:** جاجك ف سَقّز.

**جاچکە تاڵە:** جاجکەتاڵە ف سَقّز تلخ.

**جاچکەخۆشە:** جاجکەخۆشە ف سَقّز خائیدنی.

**جاخ:** ١) دەسکێ لەگەڵای توتن؛ ٢) تورەکە یان، کیسەی پەڕو توتن کە سیغارکێش هەڵی دەگرێ؛ ٣) تامان، چەپەر؛ ٤) زێد، ژێگەی مناڵی؛ ٥) قەباڵەی موڵك؛ ٦) جێگەی ئاگر؛ ٧) کاکۆڵی سەرتوێڵ، گودلە ف ١) یك بستە از برگ توتون؛ ٢) توربهٔ توتون و کاغذ سیگار؛ ٣) پرچین؛ ٤) زادگاه؛ ٥) سند مالکیّت؛ ٦) آتشدان؛ ٧) کاکُل.

**جادار:** ١) بەڕێزو حورمەت؛ ٢) جێنشین، خەلفە؛ ٣) بەجێو عاقڵانە ف ١) محترم و بُلندپایە؛ ٢) جانشین؛ ٣) معقول و بجا.

**جادوُ:** سیحر، سیعر ف جادو.

**جادوباز:** سیحرباز. جادوکەر ف جادوگر.

**جادوبەن:** نوشتەی جادو بەتاڵ کەر ف تعویذ، باطل کُنندە سِحر.

**جادوبەند:** جادوبەن ف تعویذ، دعای ضِد سحر.

**جادوکار:** سیحرباز ف جادوگر.

**جادوکەر:** سیحرباز ف جادوگر.

**جادوگەر:** سیحرباز ف جادوگر.

**جادوگەری:** سیحربازی ف جادوگری.

**جادە:** شەقام، کاروانەڕێ، ڕێگەی پانو پێکوت کراو ف خیابان.

**جار:** ١) دەحفە، هەل، کەڕەت؛ ٢) وەخت، کات ف ١) دفعە، ٢) گاه.

**جاڕ:** ١) پەرێز، جێگەی دەخڵی دروێنەکراو؛ ٢) شوێنی گیایەکی تایبەتی: (نەرگز **جاڕ**، کەما **جاڕ**)؛ ٣) لەوەڕگە؛ ٤) ڕاگەیاندن بەدەنگی بەرز: (**جاڕیان** کێشا)؛ ٥) زەوی نەکێڵدراو ف ١) زمین درو شدە؛ ٢) محلّ رُستن گیاهی مشخّص؛ ٣) مرتَفَع؛ ٤) اعلام عمومی؛ ٥) زمین شخم نزدە.

**جاران:** لەکاتی رابردودا، بەرلە ئێستە ف سابقاً.

**جاربەجار:** ١) کات لەدوای کات؛ ٢) کەڕەت لەدوای کەڕەت ف ١) گاهبگاه؛ ٢) دفعەبەدفعە.

**جارجار:** بەهەڵکەوت ف احیاناً.

**جارجارە:** لەزۆر کاتاندا کاتێك ف گاه‌گاه.

**جاڕچی:** ڕاگەیەن، قاوکەر بۆدەنگو باسێك ف جارچی، مُنادی.

**جاڕدان:** ١) ڕاگەیاندن بەدەنگی بەرز؛ ٢) کۆکردنەوەی مەردم بۆکارێ ف ١) جارکشیدن؛ ٢) مردم را برای کاری جمع کردن.

**جاڕ ڕاهێشتن:** خەبەرگوتن بەقەو ف جارکشیدن.

**جارز:** وەڕەز، عێدز، بێ‌مەعد، بێزار ف بیزار.
**جارزبون:** وەڕەزبون ف بیزارشدن.
**جارزکردن:** وەڕەزکردن ف بیزار کردن.
**جارس:** وەڕەز، قەڵس ف پَکَر.
**جارکێشان:** جاڕ راهێشتن ف جارکشیدن.
**جارماز:** بەرماڵ، دوگرد، جانماز ف سجاده.
**جارنان:** جارجارە، جاربەجارێ ف گاه‌بگاه.
**جارو:** ١) قسڵاو و خوڵەمێش بۆ سواغدانی حەوزو...؛ ٢) گەسک، گێزک، گزک ف ١) ساروج؛ ٢) جارو.
**جاروبار:** جارنان ف گاه‌گاه.
**جاروبەند:** سواق دراو بەجارو، قسڵ و خوڵەمێش تێهەڵسواو، شوریاو ریژکراو ف ساروج اندود.
**جاروفک:** گەسک ف جارو.
**جار وەجارێ:** کاتێ لەکاتان ف گاه‌گاهی.
**جارە:** ١) جالـــە، ئوتـــوز، تاوێرە بەرد، بەردی گلارەوەبـــو لەکێف؛ ٢) ئامرازێکی موسیقایە ف ١) سنگ غلتیده از کوه؛ ٢) از آلات موسیقی.
**جاری:** ژنی برای مێرد ف زن برادر شوهر.
**جارێ:** ١) کاتێک؛ ٢) ئێستا بهێڵە، لێ گەرێ: (جارێ باوابێ) ف ١) یك وقت؛ ٢) بگذار باشد.
**جـارێ‌تر:** ١) وەختێـکی دیـکە؛ ٢) دەفعەیەکی تر ف ١) دیگرگاه؛ ٢) دیگر بار.
**جاری جاران:** بەرلە ئێستا، لەپێشودا ف روزهای پیشین، درگذشته.
**جارێک:** ١) کەڕەتێک، هەلێک؛ ٢) وەختێک، دەمێک ف ١) یکبار؛ ٢) یك زمان.
**جارێکان:** ١) وەختێ لەرابردودا؛ ٢) نەهێشتا ف ١) زمانی در گذشته؛ ٢) نه هنوز.
**جارێک لەجاران:** دەمێك لەدەمان ف وقتی از اوقات گذشته.
**جارێکیان:** جارێك لەجاران ف یکبار در گذشته.
**جاسوس:** شوفار، زوانگیر، خەوەردز ف جاسوس.
**جاسوسە:** مەگەزە، قوتکەی سەرلولەی تفەنگ ف مَگَسَك تُفنگ.
**جاش:** ١) بەچکەی کەر؛ ٢) پیاوێ ژن بەوادە مارەدەکاو کرێ دەستێنێ؛ ٣) برێتـی لە خۆفـــرۆش بەداگیر کەرانـی وڵات ف ١) کُرّه خر؛ ٢) مُحلل؛ ٣) کنایه از خودفروش به بیگانه.
**جاشک:** بەچکەکەر، دەحشک، جەحشک ف کُرّه‌خر.
**جاشکۆڵە:** بەچکەکەری ساوا ف کُرّه‌خر کوچولو.
**جاشولکە:** جاشکۆڵە ف کُرّه‌خر کوچولو.
**جاف:** ١) جلف، بەدئـــەدا، نەگونـجـــاو؛ ٢) ناوی عەشیرەتێکی زۆرو گەورەیە لەکـوردستان. *کەلە هۆزی گاوانی قەدیمەوە کەوتونەوە*؛ ٣) گیایەکە لەئاودا دەڕوێ گوڵێکی وەنەوشی هەیە ف ١) جلف و بدادا؛ ٢) نام عشیره‌ای در کُردستان؛ ٣) گیاهی است آبزی با گُلهای بنفش.
**جافر:** سوکەڵەناوی جەعفەر ف مُخفّف جعفر.
**جافری:** جەعفەری، بەقدەنوس، سەوزیە دەخورێ ف جعفری، یکی از سبزیجات.
**جافەتی:** مەڵبەندی جاف‌نشین ف منطقهٔ سکونت ایل جاف.
**جاکەش:** دەویت، فورمساخ، گەوواد ف قرمساق، دیوث.
**جاگرتە:** دانیشتوی هەمیشەیی لەئاواییدا ف مُقیم.
**جاگە:** شوێن، جێگە ف مکان.
**جال:** بارتەقا، لەبەرانبەردا، لەتۆڵەدا، قەرەبو ف در ازای، در عوض.
**جاڵ:** ١) جحێڵ، نۆجوان، لاو؛ ٢) داو، داو لەهەودا مو بۆ مەل راو کردن ف ١) بُرنا، جوان؛ ٢) دام.
**جاڵجاڵوکە:** کاکڵەموشان، پس‌پسەکۆڵە، پیرۆشک ف تارتنك، عنکبوت.
**جالە:** دار یان تەختەی بەسەر روبار رایەڵ کراو بۆ پەڕینەوە ف چوبی که بجای پُل بر آب نهند.
**جاڵە:** جارە، تاوێر، ئوتوز ف سنگ غلتان از کوه.
**جام:** ١) قاپ، زەرك، دەفری قوڵی چکۆڵە لەکانزا، تاس؛ ٢) شوشە؛ ٣) ئاوێنە؛ ٤) جێگەی من، شوێنی من ف ١) طاس؛ ٢) شیشه؛ ٣) آینه؛ ٤) جای من.
**جاماڵ:** ماڵە گەورە، خانەدان ف خاندان.
**جامالگە:** هەواری چۆڵ، زۆزانا کۆچەر لێ نەمایی ف ییلاق خالی شُده.
**جـامانە:** ئاغابانو، پارچەیێـکە پیـاوان دەیکەنە مێزەر ف نوعی دستار مردانه.
**جامباز:** ١) دەلاڵی ولاغ فرۆشتن؛ ٢) فێڵبازو دەسبڕ ف ١) دلال ستور؛ ٢) کُلاهبردار.
**جامبـازە:** دەست بڵندکردن و هەڵبەزینی ئەسپ یان وشتر ف ورجَهیدن اسب یا شُتر.
**جامبـازی:** ١) دەلاڵی ولاخ فرۆشتن؛ ٢) دەسبـڕی و فێڵبـازی ف ١) دلالی ستور؛ ٢) کلاهبرداری.
**جامچی:** شوشەبڕ ف شیشه‌بُر.
**جامخانە:** شوێنی رانانی شتی فرۆشتن ف ویترین.
**جاملوس:** زوان لوس، ماستاوکەر، پیاوی بەکلکەسوتە ف چاپلوس.
**جامولکە:** زەرکی بچوك، تاسولکە ف طاسك.
**جامۆلکە:** جامولکە ف طاسك.
**جامۆڵە:** جامولکە ف طاسك.
**جامەدانە:** ١) جامانە؛ ٢) مناڵدان ف ١) نگا: جامانه؛ ٢) زهدان.
**جامەدانی:** جامانە ف نگا: جامانه.
**جامەلوس:** دەوتەڕی ریاباز ف چاپلوس.
**جامەمەرگ:** کفن، بەرگی مردو ف کَفَن.
**جامەک:** تاوێنە ف آینه.
**جامـەنـە:** ١) بەجێ‌ماو، جێ‌ماو، دواکـەوتە؛ ٢) میرات، کەلەپوور ف ١) بەجای مانده؛ ٢) میراث.
**جامێر:** ١) پیاگ خاس، خۆشمرۆ؛ ٢) ئازا، رەشید، بوێر ف ١) رادمرد؛ ٢) شجاع.
**جان:** ١) جوان، لەبەردڵان؛ ٢) گیان، روح؛ ٣) کان، مەعدەن: (گڵەجان

لەنێزیك خۆمانە)؛ ۴) باخچە ف ۱) زیبا؛ ۲) جان؛ ۳) معدن؛ ۴) باغچە.

**جانـانە:** ۱) گراوی، ماشوقە، یاری مێوینە؛ ۲) ژنی زمانددرێژو سازنەو سەڵیتە ف ۱) معشوقە؛ ۲) زن سلیطە.

**جانباز:** جامباز ف نگا: جامباز.

**جانبازە:** جامبازە ف نگا: جامبازە.

**جانبازی:** جامبازی ف نگا: جامبازی.

**جانتا:** ۱) خورجێنی چکۆڵەی سەرشانی گەڕۆکان؛ ۲) چەمەدان، باوڵی ف ۱) کولەپُشتی سیّاحان؛ ۲) چمدان.

**جاندار:** لشکرچی ترکان ف سرباز تُرك عثمانی.

**جانـداران:** مەلبـەندێكو گوندێکە لەنزیك سەردەشت لەکوردستان ف منطقە و دهی در کُردستان.

**جاندارم:** پۆلیسی ناوشار، قۆڵچی، داروغە ف ژاندارم.

**جاندبەر:** جانەوەر، زیندو ف جاندار، ذیروح.

**جانفاس:** ۱) جۆرێك حەریر؛ ۲) چندراو لەگوش ف ۱) بافتۀ ابریشمی؛ ۲) بافتۀ کنفی.

**جانکوش:** مجێوری کلیسا، خزمەتکاری کلیسا ف شماس.

**جانگ:** ۱) پێشەسەر، بانی مەڵاشو لەسەرەوە؛ ۲) کەنارەی دەموچاو؛ ۳) کرواس، جاو، تەنراوی جۆڵا لە دەزوەلۆکە: (سۆفیو سەرومێزەر، منو ئەگریجـەو دەستار / من کوشتەیی **لاجانگم**و ئەو کوشتەیی **جانگە**) «نالی» ف ۱) آهیانە؛ ۲) عارض، عذار؛ ۳) کرباس.

**جانگی:** جانگ ف آهیانە.

جانماز: بەرماڵ، دوگرد، جارماز ف جانماز.

**جانو:** بەچکە ئەسپ، جوانو، جانی ف کُرّە اسب.

**جانو ئەسپ:** بەچکەی نێری ئەسپ ف کُرّە اسب نَر.

**جانومایـن:** بەچکەی مێوینەی ئەسپ ف کُرّە اسب مادینە.

**جانـەر:** گوڵێکی سپی ئامـاڵ بۆری بۆن خۆشە ف گلی سفید مایل بە خاکستری خوشبو.

جانەمەرگ: گوڵەنەورۆزە ف گلی است نوروزی.

جانەوەر: ۱) زیندەوەر، خاوەن گیان؛ ۲) حەیوانی دڕندەو ترسێنەر ف ۱) جانور؛ ۲) حیوان دَرّندە و مهیب.

**جانی:** جانو، بەچکەی ماینو ئەسپ ف کُرّە اسب.

**جاو:** ۱) شاڵی لە داوەلـۆکـە، جانگ؛ ۲) کۆنەو شکاو: (**ئاسنجاو**)؛ ۳) پاشگری بەواتا کەسێك کە شتێك لەناو دەمدا دەجوێ: (**بنێشتجاو**، **جاچکـەجاو**) ف ۱) کرباس؛ ۲) شکستە و از کار افتادە؛ ۳) پسوند بەمعنی خایندە.

**جاوپێچەك:** دارێ کەجۆڵا جاوی تێ دەپێچێ ف چوبی کە کرباس بر آن پیچند.

**جاوراو:** جۆراو، جاویاگ، لەدەمدا هاتوچو پێ کراو. وەك بنێشت ف خاییدە.

**جاوراوە:** ئاسنی قەڵش بردە ف آهن ترك خوردە.

**جاونـانەوە:** ۱) رایەڵ کردنی داوی جریشاوی بۆزو؛ ۲) بریتی لە هاتو چوکـردنی زۆرو بەلـەز ف ۱) ردیف کردن تارهای شال؛ ۲) کنایە از آمدوشُد با شتاب.

**جاوگ:** کرواس، جاو، جانگ ف کرباس.

**جاوەجـا:** ۱) گوێزانـەوەو دامـەزراندن؛ ۲) هەرئێستە، جێ‌بەجێ ف ۱) جابجاکردن؛ ۲) فوراً.

**جاوەرجا:** جێ‌بەجێ، دەس بەجێ، هەرئێستە ف بیدرنگ، فوراً.

**جاوەلۆکە:** گیایەکە مەڕ بیخوا ماستی هەرەباشی دەبێ ف گیاهی است.

**جاوەنە:** جێ راخستن، نوێن داخستن ف رختخواب پهن کردن.

**جاوی:** ۱) جیوە، جەوی، شیلەی داروگیا کە خۆی دەری دەکـا؛ ۲) کاری رابردە بەماناجۆی، لەناو دەمیو لەژێر ددانی‌دا هاوردیو بردی ف ۱) انگم گیاهان و درختان؛ ۲) خایید، جوید.

**جاوینـەوە:** ۱) دوبـارە جاوین، دیسـانـەوە جۆن؛ ۲) بریتی لە چەنـد پاتـەکـردنەوەی قسە؛ ۳) ددان بەسەر شتێ رەق‌دا هێنان: (ئەسپەکە لغـاوەکـەی **دەجـاوێتەوە**) ف ۱) دوبارە جویدن؛ ۲) کنایە از تکرار مُکرّر سخن؛ ۳) دندان بر شیئی سخت نهادن.

**جاهاڵ:** لاو، جوان لەعومرا ف بُرنا.

**جاهێڵ:** جاهاڵ، نۆجوان ف نوجوان.

**جاهیل:** نەزان، تێ نەگەیشتو، دورەزانست ف جاهل، نادان.

**جاینك:** لاجانگ، کەنارەی رو ف گیجگاه.

**جببە:** جۆرە کەوایەکی پێش ئاواڵەی مەلایانەیە ف جُبّە.

**جبۆ:** ۱) سوکەڵەناوی جبرایل؛ ۲) فلانی، کاورا ف ۱) مُخفّف جبرئیل؛ ۲) یارو، فلانی.

**جبە:** ۱) جببە؛ ۲) سوکەڵەناوی جبرایل؛ ۳) ئەسپابی شەڕ ف ۱) جُبّە؛ ۲) مخفّف جبرئیل؛ ۳) جنگ‌افزار.

**جبەخانە:** ئەسپاباتی شەڕ، کەرستەی جەنگ، کارخانەی کەرستەسازی شەڕ ف زرّادخانە.

**جبەڵخانە:** جبەخانە ف زرّادخانە.

**ججاڵ:** کەرسوارێکی خەیاڵیە کەرۆژێك دنیا دەگرێ، جرجاڵ ف دَجّال.

**ججە:** دەنگ‌دانی مەڕ بۆ دەرکەوتن لە هۆڵ ف حرف راندن گلّە از آغل.

**ججـو:** جوچـکەمەل لەزاراوەی منـاڵانـدا ف جوجۀ پرندە بە زبان کودکان.

**جخار:** خەم، کەسەر، کوڵ ف غم، اندوە.

**جدا:** جیاواز، جگە ف جُدا، سوا.

**جدەو:** ۱) لەکار کەوتو؛ ۲) ولاخە بەرزەی پشت بریندار: (پشتی ریشو شانی زامـــدارو جدەو بو، ناعیلاج / چەنـد قروشێکم هەبـو، بۆمدا بەنـەوتو عەنـزەرۆت) «شێخ رەزا» ف ۱) از کار افتادە؛ ۲) بارکش پُشت ریش.

**جڕ:** ۱) بێ هێزی: (**جڕم** دەرهات)؛ ۲) دژواری: (بە **جڕەجڕ**رام کێشا)؛ ۳) دڕانو لەت بون: (پارچەکەم گرتو**جڕم**دا)؛ ۴) زڕت بۆ گاڵتە پێکردن ف ۱) ستوە؛ ۲) دشواری؛ ۳) جر خوردن؛ ۴) شیشکی.

**جڕاجڕ:** شەڕەچەقە، شەڕە دندوکە، کێشەی زوانی ف نزاع لفظی.

**جڕان:** ۱) ئاونگی بەردین؛ ۲) بەنـدهـاتنی میز: (بەمیزەوە **دەجڕا**) ف ۱)

هاون سنگی؛ ۲) بندآمدن ادرار.

**جرپن:** دانەسەکناو، هەدانەدەر، ئۆقرەنەگرتو ف بازیگوش، بی‌آرام.

**جرپۆ:** جرپن ف بازیگوش.

**جرپوجۆپ:** هەڵبەزدابەزی بێ‌فایدە ف بازیگوشی.

**جـرت:** ۱) جلـفو بێ‌شـەرم؛ ۲) زڕت، شیرْ ف ۱) جلف، هرزه؛ ۲) شیشکی.

**جرتوفرت:** جرپوجۆپ ف بازیگوشی.

**جرتـە:** ۱) کەپەنك، باڵتەی لباد؛ ۲) نیوەنۆزە: (هەر جرتەی دێ) ف ۱) فرجی؛ ۲) نالهٔ خفیف.

**جرتی فرتی:** دانەسەکناوی جلف ف بازیگوش جلف.

**جرج:** مشکە کوێرە، مشکی دەشتی ف موش کور، کلاك موش.

**جڕجاڵ:** ججاڵ ف دَجّال.

**جڕجڕە:** چوێلە کۆکێکی جوانو دورەنگە ف چرخ ریسك.

**جڕجۆنگانێ:** شەڕانیو بەدفەڕو نەگونجاو ف ناهنجار و بداخلاق.

**جرد:** جرج ف کلاك موش.

**جڕدان:** دڕاندن، دادڕاندن ف دریدن.

**جڕداهێشتن:** زڕت کێشان، شیرداهێشتن ف شیشکی بستن.

**جڕداهێلان:** جڕداهێشتن ف شیشکی زدن.

**جڕنا:** قسەی بێ‌تامو خوێ ف چَرَند.

**جڕوجانەوەر:** شتی هیچو پوچ ف اشیاء بی‌ارزش.

**جرنگ:** دەنگی بەسەریەکدا کەفتنی زیو ف صدای برهم افتادن نُقره.

**جرنگـو هوڕ:** دەنگی زۆری ویك کەوتنی کانزا ف درنگ درنگ، صدای برهم افتادن فلز.

**جرنگـەجرنگ:** دەنگی زۆری بەسەریەکدا کەوتنی زیو ف صدای زیاد برهم افتادن نقره.

**جڕوجیاز:** کەل پەلی ماڵ ف وسایل منزل.

**جروکە:** دەنگی خوێندنی جوچکە ف صدای جوجهٔ پرنده.

**جڕها:** وشەی گاڵتە پێکردن ف کلمهٔ تمسخُر.

**جڕهاتن:** توشی تەنگانەبون، نارەحەت بون ف بەتنگ آمدن.

**جڕە بەگزادە:** مەلێکی رەنگاو رەنگی جوانە ف پرنده‌ای رنگارنگ.

**جڕەجڕ:** ۱) زەحمەتو دەرد؛ ۲) شەڕەقسە ف ۱) درد و رنج؛ ۲) جَدَل.

**جریت:** جلیت، سوکەڵە دارێك کەسواران لەمەیداندا بە یەکتریان دادەدا ف چوبی کوچك که سوارکاران با آن بازی می‌کنند.

**جریتـان:** جـلیت بازی، گەمەی جـلیت ف بازی سوارکاران با چوب «جریت».

**جریتێن:** جریتان ف نگا: جریتان.

**جریك:** دەنگی چوێلەکە، خوێندنی چێشکە ف صدای گنجُشك.

**جریکە:** جریك ف صدای گنجشك.

**جریکەجریك:** دەنگی چوێلەکان بەزۆری ف صدای زیاد گنجشکان.

**جرینگە:** دەنگی بەسەریەکدا کەوتنی زێڕو زیو ف صدای سکه‌های زر و سیم.

**جریوە:** ۱) دەنگی چوێلەکـان؛ ۲) تروکەتروکی ئەستێرە ف ۱) صدای گنجشکان؛ ۲) سوسوی ستاره.

**جریوە جریو:** جریوەی زۆر ف «جریوە»ی زیاد.

**جز:** دەنگی رۆنی داخ یان ئاسنی سورەوەبو کەناوی ویکەوێ ف صدای روغن داغ و آهن تفته در تماس با آب.

**جزدان:** کیسە باخەڵ، کیسەی چەرمین بۆ پوڵ تێکردن ف کیف بغلی.

**جززە:** ۱) گۆشتی برژاو بەزمانی منالآن؛ ۲)جز ف ۱) گوشت برشته در لهجه کودکان؛ ۲) نگا: جز.

**جزقە:** زەنگەتە، تلیسك ف تلسك.

**جزم:** ۱) پاژێ لەسـی پاژی قورعــان؛ ۲) جۆر، نەوع ف ۱) جزئی از قرآن؛ ۲) نوع.

**جزمە:** چەکمە، کەوشی لاسك درێژی تاژێر ئەژنۆ ف چکمه.

**جزو:** ۱) پاژێ لەقورعان؛ ۲) پاژ لەکتێب ف ۱) جزء قرآنی؛ ۲) جزء کتاب.

**جزوبز:** جز ف جزولز.

**جزوبەند:** پێکەوە دانو درونی پاژەکانی کتێب ف صحّافی.

**جزوە:** دەفری قاوە تێدا لێنان، قاوەجۆش، دەللە ف قهوه‌جوش.

**جزە:** ۱) دەنـگـی رۆنـی داغ؛ ۲) گۆشتی برژاو بەزوانی زارۆکــان؛ ۳) بنـەگیایەکـە دەکـولێندرێو دەیخۆن ف ۱) صدای تفتن روغن؛ ۲) گوشت بریان به لهجهٔ کودکان؛ ۳) ریشهٔ خوردنی نوعی گیاه.

**جزیلك:** چزیلك، چزلێك، دوگی سورەوەکراوی هەڵقرچاو ف جزغاله.

**جسن:** ۱) بنیچە، نەژاد؛ ۲) عەسڵ زادە، رەسەن ف ۱) نژاد؛ ۲) نجیب.

**جعیتنی:** جۆرێ ئەسپی رەسەن ف نوعی نژادِ نجیبِ اسب.

**جعیدۆك:** گیایەکە دژی مۆرانەی دار ف گیاهی است ضد موریانه.

**جغار:** جخار، خەم، خەفەت، مەینەت، کەسەر، کوڵ ف اندوه.

**جغارە:** سیغار، جگەرە، توتنی دەکاغەزەوە پێچراو بۆ کێشان ف سیگار.

**جغارەخۆر:** ئالودەی سیغار ف سیگاری.

**جغارە کێش:** جغارەخۆر ف سیگاری.

**جغارە کێشان:** کاری جغارەخۆر ف سیگار کشیدن.

**جغجغە:** شەقشەقە، قوتوی لەیستۆك کە خڕەخڕی دێت ف جغجغه.

**جغز:** خەتی بەدەورە، کێڕی گرۆفەر ف دائره.

**جغزانێ:** گاڵتەی ناو جەغز ف نوعی بازی.

**جغزێن:** جغزانێ ف نوعی بازی.

**جغزینگ:** پەرکاڵ، ئامرازی جغزکێشان ف پرگار.

**جغەرە:** جغارە ف سیگار.

**جغەرەچی:** جگەرەفرۆش ف سیگارفروش.

**جغەرەخۆر:** جغارەخۆر ف سیگاری.

**جغەرە کێش:** جغارەخۆر ف سیگاری.

**جفت:** ۱) تێکـوڵی بەڕو؛ ۲) جوت بەرانبەری تاك؛ ۳) هاوتا؛ ۴) هەواڵ منـداڵ؛ ۵) زەوی کێڵان بەگا؛ ۶) پێوە نوسـاو، پێکـەوە لکاو؛ ۷) ژن بۆشو، شو بۆژن ف ۱) پوستهٔ بلوط؛ ۲) زوج مقابل فرد؛ ۳) همتا؛ ۴) زهدان؛ ۵) شخم با گاو؛ ۶) بهم چسبیده؛ ۷) همسر.

**جفت‌بون:** پاڵ ویکدان، پێکەوە نوسان ف جُفت شدن، بهم چسبیدن.

**جفت قۆشه:** ۱) گای شاخ وەشێن؛ ۲) بریتی له مرۆی نەحس‌و بەدفەڕ ف ۱) گاو شاخ‌زن؛ ۲) کنایه از آدمِ شوم و بدخُلق.

**جفتـه:** ۱) ماشـەی دەم باریکی سەعـات سازان؛ ۲) لەقـه، جوته؛ ۳) مێ‌ینەی حەیوان‌و مەل ف ۱) موچین مانند ساعت‌سازی؛ ۲) جُفتك؛ ۳) جنس مادهٔ پستانداران و پرندگان.

**جفتەپا:** هەستان لەبەریەکێ بەپەلە ف قیام سریع بخاطر شخصی.

**جفتـەوەشـانن:** لەقه هاویشتن، لەقه وەشـاندن، لوُشك هاویتن ف لگدپرانی.

**جفتەوەشێن:** لەقه هاوێژ، لوشك هاوێژ ف لگدپران.

**جفتەهەلخستن:** لەقه هاویشتن ف لگدپرانی.

**جفتیار:** زەوی کێڵ، جوتیار ف کنایه از کشاورز.

**جڤ:** براو، جوُله، جوُڵان ف حرکت.

**جڤات:** کۆبونەوه، کۆم بو ن ف گردهمایی.

**جڤاکی:** کۆمەڵایەتی ف اجتماعی.

**جڤی:** دوانه، ئاواڵ دوانه ف دوقلو.

**جڤین:** ۱) بزوتن ، جوُڵان؛ ۲) دژوُین، دژنام، جنێو، جوێن؛ ۳) کۆبوُنەوه ف ۱) حرکت؛ ۲) دشنام؛ ۳) اجتماع کردن.

**جڤینگه:** جێگەی کۆبونەوه ف مرکز اجتماع.

**جق:** ئاماڵ، مەیلەو ف فام، گونه.

**جقـه:** ۱) مەلێکـه تۆزێ لەچێشکه مەزنتره؛ ۲) قیتکەی پشت پەنجەی کەڵـەشێر؛ ۳) مەنجـەڵ، بەرۆش ف ۱) پرنـده‌ای کمی بزرگتـر از گنجشك؛ ۲) برجستگی پُشت پای خروس؛ ۳) دیگ.

**جك:** میچ، قاپ، جو، جگ ف شتالنگ.

**جگ:** ۱) جك؛ ۲) قاپی لەسەرپشت، ورگی جگ ف ۱) شتالنگ؛ ۲) حالت بر پُشت افتادهٔ شتالنگ.

**جگا:** جیا، جودا، جیاواز ف جُدا.

**جگاجگا:** بەش بەش، جیاجیا ف جُداجُدا.

**جگاره:** جغاره ف سیگار.

جگانێ: گەمە بەجك ف بازی با شتالنگ.

**جگەر:** جەرگ، کەزەب ف جگَر، کبِد.

**جگەرئۆتی:** گیایەکە دەرمانی کۆکەیە ف گیاهی دارویی.

**جگەرچی:** جەرگ‌ودڵ فرۆش ف جگرکی.

**جگەرسۆز:** دلۆڤان، غەمخۆر، دڵسۆز ف غمخوار و دلسوز.

**جگەرسوتان:** بریتی لەمردنی فرزەند ف کنایه از مرگ فرزند.

**جگەرسوتاو:** منداڵ مردو ف فرزند مُرده.

**جگەرگۆشه:** بریتی لەفرزەند ف کنایه از فرزند.

**جگەره:** جغاره ف سیگار.

**جگەرەچی:** جغارەفرۆش ف سیگارفروش.

**جگەرەخۆر:** جغارەخۆر ف سیگاری.

**جگەرەکێش:** جغارەخۆر ف سیگاری.

**جگێن:** جگانێ، میچێن، قاپێن ف بازی با شتالنگ.

**جل:** ۱) بەرگ‌و لیباس؛ ۲) کەل‌و پەلی سەرپشتی بارەبەر ف ۱) لباس؛ ۲) جُلِّ سُتور.

**جلبڕ:** کەسێ شتومەك دەبڕێ بۆ لیباس درون ف آنکه پارچه را برش زند.

**جلبڕان:** کۆ بونەوه بۆ لیباسی بوك بڕین‌و درون ف جشن بُرش و دوخت لباس برای عروس.

**جلبڕوکه:** مزراویلکه، شۆربای سماق‌و هێلکه ف اِشکنه با سُماق.

**جلبڕین:** جلبڕان ف نگا: جلبڕان.

**جلخۆز:** گێل‌ونەزان ف هالو.

**جلدان:** ۱) یەغـدانی جلکـان؛ ۲) چارۆکـەی سەرشان ف ۱) صندوق لباس؛ ۲) رودوشی.

**جلدرو:** خەیات، بەرگدور ف خیّاط.

**جلشتن:** شیو و کوڵ، بالاف ف رختشویی.

**جلشۆر:** ۱) بالاف کەر، بەرگ‌و شمەك شۆر؛ ۲) پەیاغی جل‌کوتان ف ۱) رختشور؛ ۲) کدینه.

**جلشۆرك:** ۱) جێگەی بالاف، شوێنی کەل‌وپەل لێ‌شوشتن؛ ۲) داری جل‌کوت ف ۱) مکان رختشویی؛ ۲) کدینه.

**جڵف:** سوك‌و چروك، ئاکار ناشیرین ف قرت، جلف.

**جڵفڕ:** هەدانەدەرو شێتوکه، گەللایی ف خُل و بی‌آرام.

**جڵفـۆ:** پارچەیەکی سوره، بەسەر بازی‌دا ئەدن تا کەوی دەبێ ف پارچهٔ قرمزی که باز را با آن رام می‌کنند.

**جڵفی:** هەرزەکاری‌و سوکی ف قرتی گری.

**جڵق:** ۱) قەڵـــب، بێ‌رەواج: (مـــن کەیەك پاردیی **جڵقم** له ئەزەڵ شك نەدەبرد) «شێخ رەزا» ۲) دەسپەڕ، مشته، شاوەت هێنانەوه بەدەست ف ۱) بی‌رواج، بُنجُل؛ ۲) استمنا.

**جڵقاو:** ئاوی ناخاوێنی شیووکوڵ ف آب پس مانده از رختشویی.

**جڵقه:** دەنگی قوڕو لیته که پای تێدەخەن ف صدای پا در لجن و گل و لای.

**جلقێ:** دژوێنێکه ژنانه ف دُشنامی زنانه.

**جلك:** لیباس، کەل‌و پەل، جل، پۆشاك ف لباس.

**جلکار:** بەرگی کارێ ف لباس کار.

**جلگا:** جۆرێك ماسی ف نوعی ماهی.

**جلنبۆر:** تەمەڵ، تەوەزەل ف بیکاره و تنبل.

**جلنگه:** دەنگی شکانی چینی ف صدای شکستن چینی.

**جلوا:** سیس‌و ژاکـاو: (**جلوابـۆی** جەوجـەمێ دتـازه / رەنگێ سەمەنی بەجای غازه) «خانی» ف پژمرده.

**جلوبەرگ:** کەل‌پەلی دەبەرکردن ف لباس.

**جلوجۆڕ:** بەرگ‌و ئەسپابی ولاخی بارەبەر ف پوشش باربر.

**جله:** ۱) جانـــەوەرێکی ئاوی هەشت‌پایه له دەریادا؛ ۲) جانـــەوەرێکی خڕ وپانه لەئاودا، زیندەوەری چکۆڵه راودەکا؛ ۳) رەگ‌و ریشەی وردی دارەبی قەراغ ئاو که پێش بەئاو دەگرێ؛ ۴) گیایەکه وەك قەوزه سەرئاو دەکـەوێ‌و دەتـەنێتـەوه ف ۱) اُختاپوس، هشت‌پا؛ ۲) حیوانی آبزی بالشك مانند؛ ۳) ریشه‌های بید کنار آب؛ ۴) جل وزغ.

**جلەشڕه:** گیای قەوزه ئاسایی، جله ف جل وزغ.

**جڵەو:** هەوسار، رەشمە، قامچی لغاو ف افسار، زمام.
**جڵەودار:** ١) هەوسـارکێش؛ ٢) کەسێ لەپێش سوارانـەوە دەڕوا ف ١) جلودار؛ ٢) راهنمای سواران.
**جڵەوکێش:** جڵەودار ف جلودار.
**جڵەوگیر:** کۆسپی سەرریگە ف مانع سر راه.
**جڵەوگیرە:** جڵەوگیر ف مانع سر راه.
**جلیت:** جریت ف چوبدستی سوارکاران در مسابقهٔ سوارکاری.
**جڵیتاو:** قوڕوچڵپاو، قوڕاوی شل ف لای و لجن.
**جلیتانێ:** جریتبازی، جلیتین، گەمەی جلیت ف نگا: جریتان.
**جلیتێن:** جلیتانێ ف نگا: جریتان.
**جلیتبازی:** جلیتانێ: (دریغ بۆ ئەو زەمانە، ئەودەمە،ئەوحانە، ئەو رۆژە/ کە مەیدانی **جلیتبازی** لەدەشتی کانی ئاسکان بو) «شێخ رەزا» ف نگا: جریتان.
**جلیتقە:** سوخمەی بێ قۆڵی پیاوانە، سەدریە ف جلیقە.
**جلیسقە:** جلیتقە ف جلیقە.
**جڵێق:** ١) شیلان، دڕکێکە لەپایزا بەرێکی سوور دەگرێ؛ ٢) لیچق، لیلق ف ١) نسترن کوهی؛ ٢) لزج.
**جلیقە:** جلیسقە ف جلیقە.
**جم:** بزاو، بزوتن، جوڵە ف جُنبش، حرکت.
**جمان:** بزوتن، جوڵان ف جنبیدن.
**جمحە:** جوحمە، هەینی ف جُمعه، آدینه.
**جمدان:** جوڵان، تەکان خواردن ف جُنبش.
**جمس:** جوڵە، جم ف جُنبش.
**جمشت:** جمدان، جمس ف جُنبش.
**جمشیرگ:** جمگە، جومگە، بەندی نێوان دەستو باسك ف مُچ دست.
**جمك:** دوانە، هەواڵ دوانە، زگەدوانە ف دوقلو.
**جمکوت:** پڕایی زۆری خەڵك، قەرەباڵغ ف ازدحام.
**جمگە:** جمشیرگ، جومگە ف مُچ دست.
**جمگەجمگە:** بەندبەندی ئەندام ف بندبندِ اندام.
**جمنای:** جوڵان، بزوتن ف جُنبش.
**جموجوڵ:** بزوتنی زۆر ف جُنب و جوش.
**جمە:** کۆمەڵو پڕایی خەڵك: (بازاڕەکە **جمەی** دێت) ف ازدحام.
**جمیان:** جوڵان، بزوتن ف جُنبش.
**جمین:** بزوتنی خەڵکی زۆر ف حرکت انبوه مردُم.
**جمێن:** جنێو، دژوێن، سخێف، جوێن، دژمان ف دُشنام.
**جن:** جنۆکە، جندۆکە، عەجنە ف جن.
**جناوەر:** جانەوەر، دەعبا ف جانور.
**جنجیر:** ماری دورەنگ، ماری خاڵدار ف مار دورنگ، اَرقم.
**جنچـك:** ١) دەنکی خورماو میوە؛ ٢) هەڵتوتەکان، قونەڵتسدان ف ١) هستە؛ ٢) چمباتمەزدن.
**جنچکان:** توتەکان، هەڵتروشکان، قوُنەڵتسدان ف چمباتمەزدن.
**جنچکە:** هەڵتروشکان ف چمباتمەزدن.

**جند:** جنۆکە، جن، عەجنە ف جن.
**جنڕۆکە:** جند ف جن.
**جندۆکە:** جند ف جن.
**جندە:** قاحبە، ژنی خۆفرۆش ف فاحشە.
**جندەباز:** پیاوی فاسقو ئاشنای قەحبە ف جندەباز.
**جندەخانە:** ماڵەجندە، قاحبەخانە، مەکۆی ژنانی خۆفرۆش ف محلّهٔ بدنام.
**جنـدی:** ١) ئازا، بەکار، رەشید؛ ٢) جوان، سپەهی؛ ٣) باش، چاك؛ ٤) چەکدار لە سوپادا ف ١) شُجاع؛ ٢) زیبا؛ ٣) خوب؛ ٤) مسلّح در سپاه.
**جنسری:** گوڵێکی بەهێشوی سپی بۆن خۆشە ف گُلی است.
**جنك:** بەرگو شمەك، جڵك، کەل‌پەل، پۆشاك ف پوشاك، لباس.
جنکە: ئاتەواو هەنجنراو ف کمی انجیدە شدە.
**جنـگ:** ١) جم، بـزاو، جوڵە؛ ٢) شمـەك، کەل‌وپەل ف ١) جُنبش؛ ٢) پۆشاك.
**جنگدان:** بزوتن، جوڵان ف جُنبیدن.
**جنگز:** شەڕانی، بەدفەڕ، نەگونجاو ف ستیزەجو.
**جنگڵ:** گینگل، خۆبزاوتن، جوڵانەوە ف جُنبیدن.
**جنگن:** شەڕانی، دڕ، نەگونجاو، جنگز ف ستیزەجو.
**جنگوجوڵ:** بزوتنو هەدانەدان ف جُنب‌وجوش.
**جننە:** جندە ف جندە.
**جننەباز:** جندەباز ف جندەباز.
**جننەخانە:** جندەخانە ف فاحشەخانە.
**جنۆکە:** جندۆکە ف جن.
**جنە:** جندە ف جندە.
**جنێ:** جندە ف جندە.
**جنیاگ:** هەنجناو، وردکراو بە چەقۆ ف انجیدە.
**جنیقین:** راپەڕین، لەپڕ وەخەبەرهاتن ف پریدن از خواب.
**جنیك:** ١) لاجانگ، قەراغ رومەت؛ ٢) گودلە، فڕ؛ ٣) بان مەلاّشو ف ١) عُذار؛ ٢) کاکُل بر پیشانی؛ ٣) آهیانە.
**جنێو:** جوێن، دژمان، سخێف ف دُشنام.
**جنێودان:** جوێن‌دان، سخێف‌گوتن ف دُشنام دادن.
**جنێوفرۆش:** زمان پیس، جوێن دەر، سخێف بێژ ف بدزبان.
**جنین:** هەنجنین، وردکردن بە چەقۆ ف انجیدن.
**جۆ:** ١) جۆگە؛ ٢) دەغلی هەواڵی گەنم، جە ف ١) جویبار؛ ٢) غلّهٔ جو.
**جوُ:** ١) جۆگە، جۆبار، شوێنی ئاوپێداروێشتن؛ ٢) جوڵەکە، موسایی؛ ٣) گیان، رۆح ف ١) جوب؛ ٢) یهودی؛ ٣) جان.
**جواب:** پەرسف، جواو، وەرام دانەوە ف جواب، پاسُخ.
**جوابدان:** دەرکردن، قسەلێ نەبیستن ف راندن.
**جواب دانەوە:** پەرسف وەدان، جواب لێ وەگەڕاندن ف پاسخ گفتن.
**جوابکردن:** جوابدان، جواوکردن ف دست رَد زدن.
**جوابنامە:** قاقەزی جوابدانەوە ف پاسُخنامە.

**جوابەجەنگی:** جواوجوی، بەدەم داهاتنەوە ف بەجَدَل جواب دادن.
**جوات:** ۱) جڤات، کۆمەڵ؛ ۲) کۆبونەوە؛ ۳) مەجلیس، کۆمەڵگا ف ۱) اجتماع؛ ۲) گردهمایی؛ ۳) انجمن.
**جوار:** جوۆرك، تۆری ئالك ف توربۀ علوفه.
**جوال:** کیسەی دەغلی گەورەی یەكلایی لەخوری چندراو، جەواڵە ف جوال.
**جواڵ:** جوال ف جوال.
**جواڵدوز:** شوژن، سوژن ف جوالدوز.
**جوامێر:** جامێر ف رادمرد، شُجاع.
**جوان:** ۱) سپەهی، دەلال، قەشەنگ؛ ۲) جحێل، لاو، تازەپێگەیشتو؛ ۳) پەسند؛ ۴) ژوان ف ۱) زیبا؛ ۲) بُرنا، جوان؛ ۳) پسندیده؛ ۴) میعاد.
**جواناو:** ئارەقی سەرەمەرگ، خۆهدانی نەخۆشی لەمردن ف عَرَقِ حالِ نزع.
**جوانچاك:** گەلەك سپەهی، خوشیك ف زیباروی.
**جوانچاڵ:** جوانچاك ف زیباروی.
**جوانخاس:** پیاوی زۆرجوانو رێكوپێك ف خوش تیپ.
**جوانكار:** ۱) رازێنەوە، بوك جوانكەر؛ ۲) دەس رەنگین، بەهونەر ف ۱) آرایشگر؛ ۲) هنرمند.
**جوانكە:** نۆجوان، تازەلاو ف نوجوان.
**جوانكەر:** رازێنەوە، وەڕازێن ف آرایشگر.
**جوانكەڵە:** چكۆڵەی جوانو بەردڵ ف زیبای کوچولو.
**جوانكیلانە:** جوانكەڵە ف کوچولوی زیبا.
**جوانمەرد:** جامێر ف رادمرد.
**جوانن:** بزواندن، جولانن ف جنباندن.
**جوانو:** جانو، بێچوە ئەسپو ماین ف کُرّۀ اسب.
**جوانو ئەسپ:** بەچكەی نێری ئەسپ ف کُرّۀ نَر اسب.
**جوانولكە:** جانوی تازەزاو ف نوزاد اسب.
**جوانوماین:** بەچكەی مێوینەی ئەسپ ف کُرّۀ مادینۀ اسب.
**جوانەزوە:** عازەوی، زیپكەی دەموچاوی لاوی تازەپێگەیشتو ف عَزَبی، جوش صورت نوجوان.
**جوانەزەوە:** جوانەزوە ف نگا: جوانەزوە.
**جوانەگا:** گای سێ بەهارە، بەرجوت ف گاو نر سەبهار دیده.
**جوانەمەرگ:** بەگەنجی مردو، بێوەختَ مردو ف جوانمرگ.
**جوانەمەرگی:** مردن بەلاوەتی، مەرگی بێوەخت ف مرگ در جوانی.
**جوانی:** ۱) جوانو؛ ۲) خوشیكی، قەشەنگی؛ ۳) جحێلی، لاوی ف ۱) کُرّۀ اسب؛ ۲) زیبائی؛ ۳) جوانی.
**جواو:** پەرسڤ، جواب ف جواب.
**جواوجوی:** جوابەجەنگی ف بەجَدَل پاسخگوئی.
**جواودان:** ۱) پەرسڤوەدان؛ ۲) دەركردن ف ۱) پاسخگویی؛ ۲) اخراج كردن.
**جواهێر:** جەواهێرات، بەردی بەنرخ ف جواهر.
**جواهێربەن:** گەوهەر بەند، بەجەواهێر رازێنراوەوە ف جواهر بند.
**جۆبار:** جوگەی ئاوی زل ف جویبار.
**جۆبڕ:** مڵە، جانەوەرێكە رەگی گیا دەبڕێ ف آبدُزدَك.
**جوبرایل:** ناوی فریشتەی وەلام بەری خوایە ف جبرئیل.
**جوبڕك:** جۆبڕ ف آبدُزدَك.
**جۆبڕك:** جۆبڕ ف آبدُزدَك.
**جۆبڕكە:** جۆبڕ ف آبدُزدك.
**جۆبە:** جندەخانە ف محلّۀ بدنام.
**جوُت:** ۱) بەرانبەری تاك، جفت؛ ۲) كڵاوی بەڕو؛ ۳) پێكەوە لكاو؛ ۴) نێوان خۆش؛ ۵) ژن بۆشو، شو بۆژن؛ ۶) كێڵانی زەوی؛ ۷) دوگا بۆ زەوی كێڵان ف ۱) مقابل تاق، جُفت؛ ۲) كلاهك بلوط؛ ۳) بهم چسبیده؛ ۴) صمیمی؛ ۵) همسر؛ ۶) شُخم؛ ۷) دو گاو شخمزن.
**جۆت:** ۱) كێڵانی زەوی؛ ۲) حەیوانی زەوی كێڵان ف ۱) شُخم؛ ۲) حیوان شخمزنی.
**جوُتانە:** باجێكە ئاغا لەمسكێنی دەستێنێ ف مالیات ارباب از كشاورز.
**جوُتبون:** ۱) پێكەوە لكان؛ ۲) هەواڵ بونی دوكەس ف ۱) بهم چسبیدن؛ ۲) باهم ساختن.
**جوت بەندە:** ۱) خاوەنی ئەسپابی زەوی كێڵان؛ ۲) وەرزێر ف ۱) مالك وسائل كشاورزی؛ ۲) كشاورز.
**جوتقۆشە:** پیاوی شومو بێفەڕ ف آدم شوم و نحس.
**جۆتك:** ئەو دودارەی دەخرێنە سەركاریتە بۆبن ئاڵودار ف دو الوار روی شاەتیر سقف.
**جۆتكار:** جوتیار، كەسێ زەوی دەكێڵێ ف شخمزن.
**جوتكردن:** ۱) پێكەوە نوساندن؛ ۲) زەوی كێڵان ف ۱) برهم نهادن؛ ۲) شخمزن.
**جوُتكە:** جوُتە، لوُشك، لەقە هاوێژی ف لگدپرانی.
**جوتگرتن:** نێر دەگەڵ مێوینە یەك گرتن بۆ پێكەوەژین ف ازدواج.
**جوُتن:** جاوین، جوُن، لەناو دەم لەژێر ددانداهێنانو بردن ف جویدن.
**جوتنەوە:** برێتی لەچەند پاتەكردنەوەی قسە ف ژاژخایی.
**جوُتــە:** ۱) جوتكـە، لوُشـك؛ ۲) لفـەدوانـە، هەواڵ دوانـە؛ ۳) هاوتـا، هاوسەنگ؛ ۴) ئەسپێ رەگی توێڵی زەقە؛ ۵) دوقڕانی زێو، تارانی ف ۱) لگدپرانی؛ ۲) دوقلو؛ ۳) همپایە؛ ۴) اسبی كە رگِ پیشانی برجستە دارد؛ ۵) سكۀ نقرۀ دوریالی.
**جوُتەوەشاندن:** لوُشك هاوێژتن ف لگدپراندن.
**جوُتەوەشین:** لەقەوەشین ف لگدپران.
**جوُتەی سەران:** برێتی لە دوهەواڵی هەمیشە پێكەوە ف كنایە از دو دوست جانی.
**جوُتەی كەو:** دوبرالە، دوئەستێرەی لێك نزیكن ف فرقدان.
**جوُتەی كەوان:** دوبرالە، جوُتەی كەو ف فرقدان.
**جوُتەی هەنجیران:** دوئەستێرەی لای كلكی برجی دوپشك ف دو ستارۀ دنبالۀ برج عقرب.
**جوتیار:** جۆتكار، كەسێ كە خەریكی كێڵانی زەمینە ف شخمزن.
**جوتیاری:** كاری زەوی كێڵان ف شُخمزنی.

**جوتیاروك:** گولێکه پایزی ف گل حسرت.

**جوتێر:** جوتکار، جوت‌بەندە، وەرزێر ف شخم‌زن، کشاورز.

**جوجاگە:** ئێسکی پشت گوێ ف استخوان پُشت گوش.

**جوجك:** چێشکە، مەلیچك، چولەکە، پاساری ف گُنجشك.

**جوجوش:** میوانی، ئاردوڕۆن کە بۆژنی زەیستان لێ‌دەنێن ف اوماج.

**جوجـە:** ۱) جوجە مریشك؛ ۲) باڵداری پچوك لە زمانی مندالاندا؛ ۳) جانـەوەرێکی پانکـەڵەی سورە لە قەڵشتە دیوار دەژی ف ۱) جوجهٔ مُرغ؛ ۲) پرنده کوچك به زبان بچه‌ها؛ ۳) ساس.

**جوجەقورە:** گۆشت فڕوجی بەبەرسیلە لێندراو ف آش جوجه با غوره.

**جوجەڵە:** جوچکی مەل کەتازە درهاتوە ف جوجهٔ پرنده.

**جوجیلە:** جُوجەڵە ف جوجهٔ پرنده.

**جوچك:** ۱) بێچوی مەل؛ ۲) بێچوی مریشك ف ۱) جوجهٔ پرندگان؛ ۲) جوجهٔ مُرغ.

**جوچکە:** ۱) ئێسکی سمت؛ ۲) بێچوی مەل؛ ۳) کلك ف ۱) دنبالچه؛ ۲) جوجه؛ ۳) دُم.

**جوچکەبڕیاگ:** ۱) دوابڕاو، لەزارو زیچ بێ‌بەش؛ ۲) کلك قرتاو ف ۱) مُنقَطعُ النسل؛ ۲) دُم بریده.

**جوچکەلەقێ:** بریتی لە مەرایی و زمان لوسی‌کردن ف کنایه از چاپلوسی.

**جوحتك:** لوُشك، جوتە، لەقەهاوێژی ف جُفتك.

**جوحمە:** جۆعمە، هەینو، روژائینێ ف جمعه.

**جوخ:** فاسونیا، پارچەی لەخوری بۆ کەواوپاتوڵ ف فاستونی.

**جوخورە:** زەردی وەری ف پرنده‌ای کوچك.

**جوخین:** خەرمان، بێدەر؛ ۲) خۆیان، کلۆشی گێرە کراوی کۆم‌کراو ف ۱) خرمن گندم؛ ۲) خرمن کوبیده و توده شده.

**جودا:** جیا، جگە، جیاواز ف جُدا، سوا.

**جودار:** گیاندار، زیندو ف جاندار.

**جوداس:** گیایەکە لەجۆ دەکا ف گیاهی شبیه جو.

**جودان:** ۱) ددانێکی ئەسپ کەلەپیری‌دا لوس‌دەبێ؛ ۲) گۆخڵ ف ۱) از دندانهای اسب؛ ۲) شالیکار.

**جودانە:** جودان ف نگا: جودان.

**جودایی:** ۱) جیاوازی؛ ۲) لێك دور کەوتنەوە ف ۱) تفاوت؛ ۲) فراق.

**جودرەو:** ۱) مانگی جۆزەردان؛ ۲) هەرەتی جۆدرونەوە ف ۱) خُرداد ماه؛ ۲) موسم درو جو.

**جۆر:** ۱) تەرز، نەوع؛ ۲) تەحر، ئاوا، رەوشت ف ۱) نوع؛ ۲) روش.

**جۆر:** جوڕ ف نگا: جوڕ.

**جوڕ:** ۱) لوڕ، بن جلێکی پوش تێ ئاخنراوە دەخرێتە سەرپشتی بارەبەر لەبن سەرجلەوە: (جل‌وجوڕی قاترە کە بێنە)؛ ۲) خورجێن؛ ۳) پارچە بەرەی کۆن ف ۱) قسمت انتهائی پالان؛ ۲) خورجین؛ ۳) کُهنه پلاس.

**جوراو:** جاوراو، جیاویاو، جاویاگ، جوتراو ف خائیده.

**جوڕاو:** ۱) گۆرەوی؛ ۲) جۆرێ کلاشـی بن چەرم ف ۱) جوراب؛ ۲) نوعی گیوه که کفهاش چرم است.

**جورجور:** نەوع نەوع، چەندتەرح ف جوروا‌جور.

**جورعەت:** وره، وێران، هێزی دڵ ف جرأت.

**جوڕك:** ۱) توری کاو ئالیك؛ ۲) خورجێن ف ۱) توربهٔ علوفه؛ ۲) خُرج.

**جوڕکردن:** رێك خستن، دروست کردن ف جورکردن.

**جوڕکە:** تورەکەی ئالف ف توربهٔ علوفه.

**جوڕنە:** خەزێنە، حەوزۆکەی حەمام کە ئاوی گەرمی بۆ خۆشتن تێدە‌کەن ف خزینهٔ حمام.

**جوڕە:** ۱) چوێلەکـوکێکە رەنگ بۆری تامال زەرد؛ ۲) بازی نێر ف ۱) چکاوك؛ ۲) بازنر.

**جوڕەپۆپنە:** باڵدارێکە لەچولەکە گەورە ترەو کاکۆڵی هەیە ف چکاوك.

**جوڕەجوڕە:** جۆربەجۆر، نەوع نەوع ف جوراجور.

**جوڕەش:** جوریك جۆیە رەنگی رەشە ف جو سیاه.

**جوڕەکلاونە:** جوڕەپۆپنە ف چکاوك.

**جوڕەتان:** خەبەردان ف گُزارش.

**جوڕی:** جۆرێ ماسی ف نوعی ماهی.

**جوڕیان:** ۱) گۆڕان؛ ۲) زمان بەهەڵەدا چون ف ۱) تغییر؛ ۲) اشتباه لفظی.

**جوز:** جوُز ف نگا: جوُز.

**جوز:** گوێز، گردەکان ف گردو.

**جوُز:** ۱) بز، پەنجە بەقنگەوە کردن؛ ۲) دەنگی سەماوەر ف ۱) انگُلك؛ ۲) صدای سماور.

**جوزان:** گوێزان، تیخی موتاشین، موس ف اُستره، تیغ.

**جوزپێـوە‌کردن:** پەنجـە بەقنـگەوە کردن، سوك پێوە‌کردن ف انگلك کردن.

**جوُزە:** دەنگی زۆر باریك ف صدای بسیار نازك.

**جوزەرد:** هەرەتی دروێنەی جۆ ف موسم درو جو.

**جوزەردان:** ۱) سێهـەم مانگی بەهـار؛ ۲) هەرەتی جوزەردبـون ف ۱) خردادماه؛ ۲) موسم دروجو.

**جوُزەڵە:** توزەڵە، چوُزەڵە ف مزمار.

**جوست‌وجۆ:** بەشوێن‌دا گەڕان ف جستجو.

**جوستە:** پەراوێزی لێفە، قەراغ لێفە ف حاشیهٔ لحاف.

**جوسوجۆ:** جوست‌وجۆ ف جستجو.

**جوش:** ۱) کوڵ، قوڵتی ئاوی گەرم؛ ۲) لەحیم، پێکـەوە نوساندنی کانزا بەقەلایی؛ ۳) پشکۆژی دار؛ ۴) زیپکەی دەم‌وچاو ف ۱) جوش آب؛ ۲) جوش فلزات؛ ۳) غنچهٔ درخت؛ ۴) جوش صورت.

**جوشان:** ۱) وەکوڵ هاتن، هاتنەکوڵ؛ ۲) فیچقەی ئاو لە زەوی، هەڵقوڵین ف ۱) جوش آمدن، غلیان؛ ۲) فوران.

**جوشانن:** کولاندن، کەلاندن ف جوشانیدن.

**جوشانە:** دەرمانی لەناو ئاودا کولاو ف جوشانده.

**جوش‌خواردن:** پێکەوەنوُسان بەهۆی لەحیم کردن ف جوش خوردن.

**جوشـــدان:** ۱) بریتی لەزۆر بەتین کردنی سۆپـە؛ ۲) لەحیم کردن؛ ۳) وەکوڵ هێنان ف ۱) کنایه از بسیار گرم کردن بُخاری؛ ۲) لحیم زدن؛

٣) بەجوش آوردن آب.

**جۆش سەنـدن:** ١) جۆش خواردنی ئاو؛ ٢) بریتی لە گەرم‌بونی کۆڕی بەزم‌و موسیقا ف ١) بەغلیان آمدن؛ ٢) کنایە از گرم شدن مجلس رامشگران.

**جۆشن:** خۆتێ هەڵقوڵتێن، خۆرێك خەر ف چرب‌زبان.

**جۆشەك:** دوشەك، رایەخی ناو تێ‌خراوی نەرم ف تُشك.

**جۆشیان:** جۆشان ف نگا: جۆشان.

**جۆشیرە:** فەریکەجۆ ف جو نارسیده.

**جۆشیلە:** جۆشیرە ف جو نارسیده.

**جۆشین:** ١) کوڵین، جۆشان؛ ٢) جۆرێ جۆ کەرەنگی ئاماڵ شینە ف ١) جوشیدن؛ ٢) نوعی جو کە رنگش مایل بەکبود است.

**جۆشـیو:** ١) کوڵـیو، کوڵاو، کەلاتی، کەلی؛ ٢) فیچقــەکــردو ف ١) جوشیده؛ ٢) فوران زده.

**جوعمە:** هەینی، جمحە، ئین ف آدینە، جُمعە.

**جوغز:** جغز، جەغز ف دایره.

**جوق:** کۆمەڵ، دەستە ف دستە، گروه.

**جوُقن:** لاوازی بێ‌هێز، جیقن ف مُردنی و بیجان.

**جوقنە:** مەلێکی بچکۆڵەیە لەچێشکە پچوکتر ف پرندەای کوچك.

**جوُقە:** هەست‌و خوست، دەنگ‌و بزاو ف سر وصدا.

**جوُقەوار:** خاوەن گیان‌و بەهەست: (هەی **جوُقەوار**تان برێ) ف ذیروح، جاندار.

**جوُك:** ١) سوُك، جوُز، کلك بەقنگـا کردن؛ ٢) جۆگەی پچوکی ئاو؛ ٣) دەنگی بەچکەمەل ف ١) انگُلك؛ ٢) جوی کوچك؛ ٣) صدای جوجە.

**جوُکان:** دەنگ لیوەهاتنی بەچکە مەل ف جیك‌جیك جوجە.

**جوُکاندن:** جوُکان ف جیك‌جیك جوجە.

**جوُکانن:** جوُکان ف جیك‌جیك جوجە.

**جوُك پیوە کردن:** قامك بۆقنگ بردن ف انگُلك کردن.

**جوُکن:** بەبۆڵەوپرتە، نوُزەنوُزکەر ف غر ولندکُن.

**جوُکە:** ١) دەنگی باریك، نوُزە؛ ٢) دەنگی بێچوی باڵدار ف ١) صدای نازك؛ ٢) جیك‌جیك جوجە.

**جوکەجوك:** دەنگی زۆری باریك ف جیك‌جیك.

**جوُکەنە:** گیاندان، گیانەلاو ف حال نزع.

**جۆگا:** جۆگەلەی ئاو، جۆ ف جوی آب.

**جۆگە:** ١) جۆگا؛ ٢) هێلەگ، موخل ف ١) جوی آب؛ ٢) الك آردبیزی.

**جۆگەلە:** جۆگا ف جوی آب.

**جۆگەنمی:** موی رەش‌و سپی پێکەوە، موی ماش‌و برنجی ف موی جوگندمی.

**جول:** ١) رەوانی ئاو؛ ٢) جلە بارە بـەر؛ ٣) تەشکـەبەرە، پەلاس ف ١) جاری؛ ٢) جُل باربر؛ ٣) پلاس.

**جۆل:** ١) کەرکەمەڕ، کەریاپەز؛ ٢) گیای جاوەلوُکە ف ١) قسمتی از گلّە؛ ٢) علوفەایست.

**جوُڵ:** بزاو. دەگەڵ جم دەیڵێن: (هەر جم‌و **جوُڵ**یانە) ف حرکت.

**جۆلا:** بوزوتەن، شاڵ‌باف ف جولا، بافندە.

**جۆلاتەنە:** داوی جاڵ‌جاڵوکە، تاڵی کاکڵەموشان ف تارعنکبوت.

**جۆلان:** بزوتن، تەکان خواردن، جولان ف جنبیدن.

**جوُلان:** جوُلان ف جنبیدن.

**جوُلاندن:** بزاوتن، بزواندن، تەکان‌پێدان ف جنباندن.

**جوُلاندن:** جوُلاندن ف جنباندن.

**جوُلاندنەوە:** جوُلاندن ف جنباندن.

**جوُلانن:** جوُلاندن ف جنباندن.

**جۆلانە:** ١) دەیدیك، لانکی لەگوریس‌و پەڕۆ؛ ٢) گوریسی بەدارەوە کراو بۆ لێ‌نیشتن‌و راژاندن، دیلەکانی ف ١) ننو؛ ٢) تاب.

**جوُلانەوە:** بزوتن، جوُلان ف جنبیدن.

**جۆلانێ:** لەگوریس نیشتن ف تاب‌بازی.

**جوُلاو:** بزوتو، بزاوتو، تەکان پێ‌دراو ف تکان خورده.

**جۆلایی:** سنعاتی بوُزوچن، شاڵ‌بافی ف بافندگی.

**جۆلایی کەرە:** کاکڵەموشان، جاڵجاڵوکە، پەسپەسەکەرە ف عنکبوت.

**جۆلك:** جوجەڵە ف جوجە.

**جوُلگ:** جۆلا ف بافندە.

**جوُلگی:** جۆلایی ف بافندگی.

**جۆللانە:** جۆلانە ف نگا: جۆلانە.

**جوُلە:** ١) بزوتن، تەکان خواردن، جوُڵە؛ ٢) جو، موسایی ف ١) جنبش؛ ٢) یهودی.

**جوُڵە:** بزوتن، تەکان خواردن ف جنبش.

**جوُلەکە:** ئۆمەتی موُسا پێغەمبەر، موسایی ف یهودی.

**جوُلەمەرەسێ:** جۆرێك لەجۆلانە نیشتن ف نوعی تاب‌بازی.

**جوڵیان:** جوُلان ف جنبش.

**جوُم:** ١) جام، تاس، زەرك، قاپی مس؛ ٢) بزوتن، جمـوجۆڵ؛ ٣) قسەو جواب. دەگەڵ لام دەگوترێ: (من هیچ لام‌و **جوُم**م نیە) ف ١) طاس؛ ٢) جنبیدن؛ ٣) سخن پاسُخ.

**جۆم:** ١) ئاودڕ، کەندالێ ئاو دای دڕیوە؛ ٢) دەحل، قوُپی، قامیشەڵێن ف ١) آبکند؛ ٢) نیزار.

**جۆماڵ:** خاوێن کردنەوەی جۆگە لەقوڕو لیتە ف لای‌روبی جوی.

**جومبوش:** بزوتنی زۆر، جولانەوەی زیاد ف جنب‌وجوش.

**جومڕانە:** جمك، زگەدوانە ف دوقلو.

**جومـگە:** بەنـدی ئێسـك، جەمسەری دوئێسکی بەیەکتر گەیشتو ف مفصل.

**جوملانە:** ئاواڵ دوانە، جمك ف دوقلو.

**جوُمە:** کراس، گوملك ف پیراهن.

**جۆمەڕ:** جۆگەلەی نێوان تەختەو کەرد ف جوی میان کردوها.

**جۆمەرد:** جوامێر، پیاگ خاس، ئازا ف جوانمرد، رادمرد.

**جوُن:** ١) جاوین، جوُتن؛ ٢) جوێن، دژمان، سخێف، جنێو؛ ٣) ئاونگی بەردین‌و دارین؛ ٤) جوُلـەکەن؛ ٥) دەس ئاونگ ف ١) جویدن؛ ٢) دُشنام؛ ٣) هاون سنگی؛ ٤) یهودی هستند؛ ٥) دستۀ هاون سنگی.

**جونــگ:** ۱) رك، تورەیی، قەڵـــسـى، رق؛ ۲) گیایەكـی گوڵ زەردی بۆن‌خۆشە، چونگ ف ۱) خشم؛ ۲) گیاهی است.

**جۆنــگ:** ۱) جون، سوُك، جوُز؛ ۲) سڵ، قوشـقی، چەمـوش؛ ۳) پا لەجێ‌چونی ولاخ؛ ۴) بێ‌نرخ و هیچ و پوچ: (جـرۆ‌وجـۆنـگ) ف ۱) انگلك؛ ۲) رموك؛ ۳) پای از جا در رفتن دام؛ ۴) بی‌ارزش.

**جونگـە:** ۱) دەنگی باریكی ناخۆش، جوُكە؛ ۲) جومگە ف ۱) صدای نازك و ناموزون؛ ۲) مفصل.

**جونە:** ۱) مەلێكی پچوكەو رەنگاورەنگ؛ ۲) قاحبە، جندە ف ۱) سیره، پرندەایست؛ ۲) فاحشە.

**جونەگا:** جوانەگا ف گاو نر سەساله.

**جوُنــەوە:** ۱) دیــسان جاوین؛ ۲) بریتی لەزۆر گوتنەوی قسـەیەك ف ۱) دوبارە جویدن؛ ۲) كنایە از ژاژخایی.

**جوٚنی:** قولكە بەرد كە شتی‌تێدا دەكوتن، ئاونگی بەردین یان دارین، جون ف هاون چوبی یا سنگی.

**جوە:** ۱) كراس، گومـلك؛ ۲) جوٚگەلــە؛ ۳) كاورای موســـایی ف ۱) پیراهن؛ ۲) جوی؛ ۳) مرد یهودی.

**جویێ:** جودا، جیا ف جُدا.

**جوێ‌بونەوە:** ۱) لێك هەڵبران، دوركەوتنەوە؛ ۲) ماڵ بەشكردنی برایان یان شەریكان ف ۱) جُداشدن؛ ۲) تقسیم دارائی بین شركا.

**جویك:** جمك، لفەدوانە ف دوقلو.

**جوێ كردنەوە:** جیاوازكردن، هەڵاواردن ف جُداكردن.

**جوین:** ۱) جمـین، بزوتن، جوڵان؛ ۲) جاوین، جوُتن: (بنێشت جوین تامی زار خۆش دەكا)؛ ۳) جنێو، دژمان ف ۱) جنبش؛ ۲) جویدن؛ ۳) دشنام.

**جوێن:** جنێو، سخێف، دژون ف دشنام.

**جۆین:** نانی لەجۆ ف نان جوین.

**جوێندان:** سخێف گوتن، جنێودان ف دشنام دادن.

**جوێنفرۆش:** زمان پیس، سخێف بێژ ف بددهن.

**جە:** لە، ل، ژ ف از.

**جەب:** بوردن، بەخشین لەخەتاو تاوان ف عَفو.

**جەبار:** ناوی پیاوانەیە ف اسمی مردانه.

**جەباری:** ۱) كەتیرە، شیلەی زەردە گوێنی؛ ۲) ناوی عاشرەتێكی كوردە لە گەرمیان ف ۱) كتیرا؛ ۲) نام عشیرەای كُرد.

**جەبدان:** لێ بوُردن، چاولێ پۆشین، عافوكردن ف چشم‌پوشی.

**جەبر:** زۆر، خورتی ف زور.

**جەبری:** بەزۆر، بخورتی ف زوركی.

**جەبڵ:** قوڕی بەسەر یەكدا كراو، پێ‌خوێی قوڕ ف تودهٔ گِل.

**جەبلە:** ئەستورو زل، مەزن‌و ستور ف سِتَبر و گُندە.

**جەبوٚ:** فلان، كاورا، كابرا، ئەوەكە ف یارو.

**جەبــە:** ۱) سڵ، قوشقی، بەیدەس؛ ۲) یاغی، سەربـزێو؛ ۳) تایبـەتی، ئەوەك خەڵكی ئاسـایی؛ ۴) عافو، جەب ف ۱) رموك؛ ۲) یاغی؛ ۳) استثنائی؛ ۴) عفو.

**جەبەر:** لا، بەر، تەرەف ف طرف، سو.

**جەبەرە:** سەرمای زۆر، زۆر ساردو سوڵ ف سرمای سخت.

**جەبەرەنواندن:** مەلەی چوٚلەكە لە ئاوا كەنیشانەی هاتنی سەرمای توندە ف شنای گنجشك كە علامت آمدن سرمای سخت است.

**جەبەش:** شوُتی، هەنی، زەبەش، شفتی، شامی ف هندوانه.

**جەبەڵ:** چیا، كێو، كێف، كەژ ف كوه.

**جەترەقە:** جوٚرێ كولێرەی ساجی ف نوعی گردە كە بر ساج پزند.

**جەحر:** ژەهر، زەهر، ژەحر، ژەقنەموت ف زَهر، سَم.

**جەحش:** بێچوی كەر، جاش ف كُرّەخر.

**جەحشك:** جەحش، جاش ف كُرّەخر.

**جەحفەری:** ۱) جوٚرێ پۆڵا كە شیری لێ دروس دەكەن؛ ۲) سەوزیەكە، جافری ف ۱) پولادی كە شمشیرش كُنند؛ ۲) سبزی جعفری.

**جەحنی:** توُرە، زیز، رقهەستاو ف عصبانی.

**جەحنین:** رك بوُنەوە، توُرەبون، رقهەستان ف عصبانیّت.

**جەحەندەم:** دوژە، دوٚژەھ ، جەهەننەم، دوٚزەق ف دوزخ.

**جەحەنم:** جەحەندەم ف دوزخ.

**جەحەنەم:** جەحەنم ف دوزخ.

**جەحیڵ:** جوان، تازەپێگەیشتو، گەنج، لاو ف جوان.

**جەخار:** ۱) كەسەر، مەینەت، خەم، خەفەت، كوڵ؛ ۲) ساتوُر ف ۱) غم، اندوه؛ ۲) ساطور.

**جەخت:** ۱) پەلـەو لەز لە كاردا: (ئێوارە وەختـە، جرپن بە **جەختە**)؛ ۲) باش هێنان، بوٚهاتن: (دوجار پشمین **جەختە**) ف ۱) شتاب در كار؛ ۲) خوب آوردن، مبارك.

**جەختی:** چالاكی، مەزبوتی، گورج‌و گوٚڵی ف چُستی و چالاكی.

**جەد:** باپیری عەولاد پیغەمبەر(ص)، باوەگەورەی سەید ف نیای سادات.

**جەداسی:** گیایەكە ف گیاهی است.

**جەدد:** جەد ف نیای سادات.

**جەدەو:** جدەو ف نگا: جدەو.

**جەڕ:** ۱) گوٚزەی مل باریك؛ ۲) تونـدكێشـان: (جـەڕم داوە)؛ ۳) پێچ‌و بورغی ئامـرازی گوشینی كتێب‌و...: (جـەڕو مەنگەنە) ف ۱) نوعی سَبو؛ ۲) محكم كشیدن و سفت كردن؛ ۳) منگنه.

**جـەرا:** بێچـوهێنـانی بەدژواری: (ئاخری ماینەكە **جەرابو**) ف دشوار زاییدن.

**جەڕاح:** برینكەر ف جرّاح.

**جەراحات:** كێم‌و چڵك، هەوای برین ف ریم و چرك زخم.

**جەڕان:** تێ گیران بەتـوندی: (وا **جەڕاوە**، هەر دەرنایەتەوە) ف بەسختی گیركردن لای.

**جەڕاندن:** جەڕانن ف نگا: جەڕانن.

**جەڕانن:** پێچان بەتوندی، قایم پێچدان ف محكم پیچ دادن.

**جەڕب:** ئەزمون، تاقی ف تجربه.

**جەڕبادەر:** بورغی كەرەوە، دەرنەفیس ف پیچ گوشتی.

**جەڕباندن:** تاقی كردنەوە ف تجربه كردن.

**جەربـەزە:** ۱) هاروهـاج، بزۆز، هەدا نەدەر، دانەسەکناو؛ ۲) جەزرەبە، ئازاردان؛ ۳) غیرەت، ئازایەتی ف ۱) ناآرام؛ ۲) شکنجـه و آزار؛ ۳) شهامت و غیرت.

**جەربەزەیی:** هاروهاجی ف بازیگوشی.

**جەڕبی:** ئەزموده، تاقیەوەکراو ف آزموده.

**جەڕبین:** ئەزمون، تاقی کردنەوە ف آزمایش.

**جەڕجەڕ:** جەنجەر، ئامرازی کلۆش وردکردن لەدارو ئاسن: ۲) چەرخی ئاوهەڵکێشان لەبیر ف ۱) خرمنکوب؛ ۲) دولاب.

**جەڕجەڕقان:** جەڕجەڕ ئاژۆ، کەسێ کە بە جەنجەڕ گێرە دەکا ف رانندهٔ خرمنکوب.

**جەرخەتو:** ئاوگەردان، ئاوگەردێن، چەرخی دەسکدار بۆ ئاو هەڵێنجان ف آبگردان.

**جەرد:** ۱) دڵ دانـەسـەر، گوێ پێدان؛ ۲) مشکەکوێرە ف ۱) جَهد؛ ۲) موش کور.

**جەڕدان:** جەڕاندن ف تند پیچ‌دادن.

**جەردە:** چەتە، گۆران، ڕێگر ف راهزن.

**جەردی:** سوُر لەسەر کاری خۆی، گوێ‌دەر بەکار ف جدّی، با اهتمام.

**جەڕرە:** گۆزەی مل باریك ف نوعی سبو.

**جەرگ:** کەزەب، جەگەر ف جگر.

**جەرگاوس:** دڵ پڕ لەخەم، مەینەتبار ف اندوهگین.

**جەرگ‌بڕ:** بەسەرهاتی پڕلە خەم، بەڵای گەورە ف کنایە از مُصیبت بزرگ.

**جەرگ خۆرە:** خەمی گەورە، کوڵو کەسەری مەزن ف جگرخواره.

**جەرگ سـوتان:** بڕێتی لە مناڵ‌مردن، زگ‌ـسوتان ف کنایە از مُردنِ فرزند.

**جەرگ‌سوتاو:** عەولاد مردو، زگ‌سوتاو ف فرزند مُرده.

**جەرگ قایم:** ۱) بەجەرگ، ئازا، رەشید؛ ۲) بەسەبر و حەوسەلە ف ۱) شُجاع؛ ۲) شکیبا.

**جەرگ‌وناو:** هەناو، دڵو گورچیلە، مێلاك ف احشاء.

**جەرگە:** ۱) ناوەراست، دوڕ؛ ۲) هەڕەت، جەنگە ف ۱) وسط؛ ۲) موسم.

**جەرمـــە:** ۱) میوەی نیوەوشـــك؛ ۲) فەریکـەی دانـەوێڵە ف ۱) میوهٔ نیم‌خشك؛ ۲) دُلمُل.

**جەڕومەنگەنە:** گیرە، ئامرازی توندگرتنی کتێب بۆ بەرگ تێ گرتن ف منگنهٔ کتاب.

**جەڕە:** گۆزەی مل باریك ف نوعی سبو.

**جەڕەبابە:** شەتەك‌دان، توندپێچان، شەداندن ف محکم پیچیدن.

**جەرەتاو:** ئاوێ کە لەوەختی ئاوێری‌دا لەزەوی دەردەچێ، پاشاو ف آبی کە از آبیاری زیاد آید.

**جەریدە:** ڕۆژنامە ف روزنامە.

**جەریفك:** گەسگ، جارو، گێزگ، گسك، گزگ ف جارو.

**جەریمە:** تاوان، ماڵێ کە لە خەتابار دەسێنرێ ف جریمە.

**جەریە:** گیرەی چەرم تا دەیدرون ف پرسِ چرم‌دوزی.

**جەزا:** سزا، پاداشت ف پاداش، مزد.

**جەزایەرچی:** حەسەس، ئێشکدەری شەوانە ف عَسَس.

**جەزبە:** حاڵ لێ‌هاتنی دەروێش، جەزمە ف جَذبە.

**جەزرەبە:** ئازار، عەزیەت ف آزار.

**جەزرەبەدان:** عەزیەت‌دان، ئازاردان ف آزاررساندن.

**جەزرەوە:** جەزرەبە ف آزار.

**جەزم‌بون:** حاڵ لێ‌هاتنی دەروێش ف بەحالت جذبە افتادن.

**جەزمە:** حاڵ، لەهۆش تەکینەوەی دەورێش لەزیکرا ف جذبە.

**جەژن:** گێژن، جێژنە، ڕۆژی بەتاڵی‌و خۆشی ف جشن، عید.

**جەژنان:** ڕۆژانی جەژن ف ایّام عید.

**جەژنانە:** خەڵات بەهۆی هاتنی جێژنەوە ف عیدی.

**جەژنە:** جەژن ف جشن.

**جەژنەپیرۆزە:** پیرۆزبایی لە یەکترکردن بەهۆی هاتنی جێژن ف عید مُبارکی.

**جەژنەچەقالە:** جێژنێکی جوُلەکانە کە چوالەبادام‌و تۆی تیا دەترۆکێنن ف از اعیاد یهود.

**جەژنـەفـەتیرە:** جێژنێکی جوُلەکانە ئەبێ نانی کۆنی تێدا بخۆن ف از اعیاد یهود.

**جەستە:** لەش، ئەندام ف بَدَن، تن.

**جەسە:** جەستە ف تن، بَدَن.

**جەغز:** جوغز، جغز ف دایرە.

**جەفت:** جفت، کڵاوی بەڕو ف جَفْت بلوط.

**جەك:** هەڵێن، ئامرازێکە ترومبیلی پێ بەرز دەکەنەوە ف جَك اتومبیل.

**جەگەر:** کەزەب، جەرگ ف جگر.

**جەگەن:** گیایەکە لاسکی سێ‌سوچە لەزەڵکاودا دەڕوێ ف جگن.

**جەل:** ۱) چەڵاك، داری درێژ بۆ مازو تەکاندن؛ ۲) جوانەگا، بەرجوت ف ۱) چوب مازوتکانی؛ ۲) گاو نر سەسالە.

**جەلاب:** ۱) سەربڕی میر، جەللاد؛ ۲) کەوی بنە ف ۱) میرغضب؛ ۲) کبك شکاری.

**جەلاد:** میرغەزەب، سەربڕ، جەلاب ف جَلّاد.

**جەلاقی:** دۆشاوی خەست، دمسی تیر ف شیرهٔ غلیظ انگور.

**جەلالی:** عاشیرەتێکی گەورەی کوردە لە سنوُری ڕوُس‌و ترکاندا دەژین ف عشیرتی بزرگ در کردستان.

**جەلاوی:** قەوزەی سەراوان ف جل وزغ.

**جەڵتە:** خوێنی بەسیاگ ف خون لختە.

**جەلجەلوت:** دوعاو پرتەپرتی جادوگەر ف اوراد جادوگران.

**جەلد:** داردەستی درێژو باریك ف چو بدستی بلند و باریك.

**جەڵـد:** شوُمـاسی، لیزگەمـاسی کە بە شولکەوە دەکرێ ف رشتە ماهی صیدشدە کە در ترکە کُنند.

**جەلدە:** قامچی، شەلاخ ف تازیانە.

**جەڵغـــە:** ۱) سەهـــۆڵی خۆنـەگرتـو، سۆڵی نیوەبـەنیوە؛ ۲) دو داری سەرتاشراوی بەیەکەوە لکێنراو؛ ۳) بڕێتی لەکاری ناتەواو، نیمەکارە ف ۱) کاشە؛ ۲) دو چوب سر بهم آوردە شدە؛ ۳) کنایە از کار ناتمام.

**جەللاد:** جەلاد ف جلّاد.

**جەلله:** ریخ، شیاکه، گوی گاو مانگا ف سرگین.

**جەلۆ:** هەرزەپیاو، سەرسەری، ئەلوات ف اوباش.

**جەلـە:** ۱) کۆمەڵی حەیوانە کێوی؛ ۲) ماڵاتی بەزنجیرە تێك‌خراو؛ ۳) گەردانە لەگیاو گوڵ کە ئەیخەنە ملەوە ف ۱) گلهٔ بز کوهی؛ ۲) دامهای بهم بسته؛ ۳) گردن‌بند از گل و گیاه.

**جەلەب:** هەوسار، کلکەڕەشمە، پەتی ملی حەیوان ف افسار، مهار.

**جەڵەب:** کۆمەڵە مەڕو بزنێ کە بۆ فرۆشتنی دەبەن؛ ۲) ئەیاغ، حەیوانی عەیبدارو کەم‌نرخ؛ ۳) دەستەو کۆمەڵ: (**جەڵەبە** سوارێك هات) ف ۱) گلهٔ تجارتی؛ ۲) حیوان بُنجُل؛ ۳) گروه.

**جەڵەبچی:** بازرگانی مەڕو بزن‌و رەشەماڵ ف تاجر دام.

**جەڵەبدار:** خاوەنی جەڵەب ف دارای دام تجارتی.

**جەڵەبکڕ:** جەڵەبچی ف تاجر دام.

**جەڵەبی:** نەهێزا، کەم‌نرخ ف تَقَلُّبی.

**جەلـە کـردن:** تێك خستنی ماڵات: (وشتـری **جەلە کردون**، گاگێڕەی **جەلە کردوە**) ف بهم بستن دامها.

**جەڵـەو:** ۱) هەوسـار، کلکـە لغـاو، کلکە رەشمە؛ ۲) جەڵەب، کۆمەڵی لەمـاڵات یان سواران: (**جـەڵەوە** حەیوانێکم دیت، **جەڵەوە** سوارێك هات) ف ۱) افسار، مهار؛ ۲) دسته حیوان، گروه سواران.

**جەڵەوی:** جەڵەبی ف تَقَلُّبی.

**جەم:** ۱) نك، کن، لا: (پەرەی من **جەم** تەیە)؛ ۲) ژەم، هەلی نان‌خواردن: (**جەمی** نیوەڕۆ)؛ ۳) تابار، لنگەبار ف ۱) نزد؛ ۲) وعدهٔ غذا؛ ۳) لنگه‌بار.

**جەمات:** کۆمەڵ، مەردم: (**جەمات**و رەحمەت) ف جماعت.

**جەماعەت:** نوێژی بەکۆمەڵ، نمێژ بەهەڤرا ف نماز جماعت.

**جەماڵ:** جوانی، خوشیکی، قەشەنگی ف زیبائی.

**جەمـام:** رەق‌بونو ئاوسـانی ئەندام، کوترانی ئەندامی لەش: (دەستمو پشتم **جەمام** بوە) ف کوفتگی اعضا.

**جەماوەر:** قەڵەبالغ، پڕایی خەڵك ف انبوه مردم، جمهور.

**جەم‌بون:** کۆبونەوە، خڕبونەوە، کۆمەڵ کردن ف اجتماع کردن.

**جەمجستین:** لێکدانی شتی تراو ف بهم زدن مایعات.

**جەمقان:** جەمجستین ف بهم زدن مایعات.

**جەمداندن:** بونە سەهۆڵ ف یخ کردن.

**جەمدی:** سەهۆڵ کردو، بەستو، بەستەڵەك ف یخ بسته.

**جەمدین:** ۱) بونە سەهۆڵ، سەهۆڵ بەستن؛ ۲) سڕبون لە سەرمان ف ۱) انجماد؛ ۲) از سرما کرخ شدن.

**جەمسەر:** جێگەی پێکەوە لکانی دوشت ف محل اتصال.

**جەمـك:** ۱) ئەوەنـدە ماستـەی جارێك دەکـرێتـە مەشکەوە؛ ۲) بڕبڕە مژانـدنی بێچو لەگوانی دایك بۆ شیردادان: (گۆلکێ **جەمك** کە) ف ۱) مقـدار ماستی که یکبـار در مشك ریزند؛ ۲) اندك اندك مُك زدن نوزاد به پستان مادر.

**جەم مردو:** بێچوێك کە لەبەر کەم‌شیری دایك لەڕو لاوازە ف نوزادی که از کم‌شیری مادر لاغر و بیجان است.

**جەم‌مردە:** جەم مردو ف نگا: جەم مردو.

**جەمەد:** سۆڵ، سەهۆڵ ف یخ.

**جەمـەدانی:** جامـانە، جامەدانی، ئاغابانو، پارچەیەکە پیاوان لەسەری دەبەستن ف دَستار.

**جەمین:** نوێڵ، هەنیە، ناوچەوان، ئەنی ف پیشانی.

**جهمین:** تۆپین، کەوتین: (کەرێ مە **جهمی‌یە**) ف مُردارشدن حیوان حرام‌گوشت.

**جەمـینۆك:** کۆبـونەوە بۆ کـەین‌و بەین کردن ف گردهمائی برای توطئه‌چینی.

**جەناب:** وشەی ڕێزگرتن ف جناب.

**جەنازە:** تەرم، مردوی ناو تابوت ف جنازه.

**جەنتك:** خورجێنـی چـکۆڵە کە بەسەر شانیەوە دەکەن ف خورجین کوچك.

**جەنجاڵ:** هەراو هوریا، زەنازەنا، چەقەو گوڕە ف جنجال.

**جەنجەڕ:** ۱) چەرخ‌و دۆڵابی ئاوهەڵکێشان؛ ۲) ئامرازی لەدارو ئاسن بۆ گێرەکردنی کلۆش ف ۱) چرخ چاه؛ ۲) ماشین خرمن‌کوب.

**جەندرمە:** پۆلیسی تورکان ف پُلیس عُثمانی.

**جەندك:** جانتای چکۆڵە ف خورج کوچك.

**جەندەرە:** دەق، دەقاق، کەتیرە لە قوماش‌دان ف آهار زدن.

**جەندەك:** کەلاك. لاش. تەرم ف لاشه.

**جەنقین:** ڕاپەڕین ف یکه‌خوردن.

**جەنگ:** شەڕ، هەراو لێك‌دان بەدوژمنی ف جنگ.

**جەنگاوەر:** شەڕکەر، چەکداری بەشدار لە شەڕدا ف جنگاور.

**جەنگە:** هەڕەت، جەرگە ف عنفوان.

**جەنگەڵ:** لێر، دارستان، لێڕەوار ف جنگل.

**جەنگەڵی:** ۱) سەر بەدارستان، لێڕەواری؛ ۲) برێتی لەپیاوی کەم‌زان‌و گێل ف ۱) جنگلی؛ ۲) کنایه از شخص اَحمق.

**جەنگی:** ۱) شەڕانی، وازلەشەڕ: (کەڵەشێری **جەنگی**)؛ ۲) ناوی پیاوانە ف ۱) جنگجو؛ ۲) نامی برای مردان.

**جەننەت:** بەحەشت، بوهیشت، بەهەشت ف بهشت.

**جەنە:** مان، گە ف اعتصاب.

**جەنیقاندن:** ماندوکردنی نێچیر و لەغار وەستاندنی ف خسته کردن و از پا درآوردن شکار.

**جەنیقین:** وەستان لەبەر ماندویی ف توقف بسبب خستگی.

**جەو:** ۱) لەو: (**جەو**سا: *لەوساوە*)؛ ۲) جۆی هەواڵی گەنم؛ ۳) برینگ، مقەستی خوری بڕینەوە ف ۱) از آن؛ ۲) جُو؛ ۳) قیچی پشم چینی.

**جەواب:** پەرسف، جواو، جواب ف پاسُخ.

**جەواڵ:** جواڵ، تێری یەك‌لایی ف جوال.

**جەوان:** ۱) جوان، لاو، جاحێڵ؛ ۲) مەرەزەوان، ئاگاداری مەرەزە ف ۱) جوان؛ ۲) شالیکار.

**جەواهێرات:** کۆمەڵە بەردی بەقیمەت ف جواهرات.

**جەوبڕ:** برینگ، مقەستی خوری برینەوە ف قیچی پشم‌چینی.
**جەوت:** جفت، جوت، کلاوەبەڕو ف جفت بلوط.
**جەوتك:** جانتای لەچەرم، خورجێنی چەرمین ف ساك یا خورجین چرمی.
**جەوز:** ١) گوێز، گوز، قوز، گیز؛ ٢) بەریکــە لەگوێزی بچــوك دەکــا بۆدەرمان بەکاردێت ف ١) گردو؛ ٢) جوز بویا.
**جهورك:** جوڕك ف نگا: جوڕك.
**جەوسەق:** شەقام، جادە، کاروانەرێ ف جادە.
**جەوك:** جەوی، جیوەی رەشەگوێنی ف انگم گون.
**جەوکەر:** جولا، جولای جاوتەن ف کرباس‌باف.
**جەوەرە:** جەبەرە، سەرمای زۆر سەخت ف سرمای سخت.
**جەوەل:** جەبەل، کێو، چیا، کێف ف کوه.
**جەوەنــدە:** تورەکــەی چەرمین بۆ ئاوتێدا هەلگــرتن ف توربــهٔ چرمی مخصوص حمل آب.
**جەوەنە:** جەوەندە ف نگا: جەوەندە.
**جەوهەر:** ١) خاڵو میلی تیخی باش؛ ٢) رەنگ بۆ نوسین و بەن وریس؛ ٣) حونەرو زێهاتن؛ ٤) ناوی پیاوانەیە ف ١) پرند؛ ٢) جوهر نوشتن و رنگ مصنوعی رنگرزی؛ ٣) هنر؛ ٤) نامی برای مردان.
**جەوهەردار:** ١) تیخی بەخاڵو میل؛ ٢) جۆرێ چنار؛ ٣) هێژا ف ١) تیغ جوهردار؛ ٢) نوعی چنار؛ ٣) با استعداد.
**جەوی:** جیوەی رەشەگوێنی ف انگم گون.
**جەه:** جۆی هەواڵی گەنم ف جو.
**جەهخۆرك:** مەلێکە لەقوپی و زەلکاودا هێلانە دەکا ف پرنده‌ایست که در باتلاقها آشیانه کند.
**جەهداسی:** گیایەکە وەك جۆ دەچێ ف گیاهی است شبیه جو.
**جەهر:** تورەیی، سڵی، رك‌هەستان ف خشم.
**جەهزەر:** جۆزەرد، کاتی دروێنەی جۆ ف موسم درو جو.
**جەهوەر:** جەوهەر ف جوهر.
**جەهەندەم:** دۆژە، دۆزەق، جەحەندەم ف جهنم.
**جەهەندەمی:** شیاوی ئاگری دۆزەق، گوناحکار ف دوزخی.
**جەهەنم:** جەهەندەم ف جهنم.
**جەهەنەم:** جەحەندەم ف جهنم.
**جەهــەنــەم داشی:** شتێکــە وەك بەرد حەکیمی چاوان ناوپیلوی پێ دەکرێنن ف سنگ جهنم.
**جەهەنەمی:** جەهەندەمی ف دوزخی.
**جەهێڵ:** جوان، جحێل، گەنج، لاو، تازە پێ‌گەیشتو ف جوان.
**جەیران:** ئاسك، کەژاڵ، مامز ف آهو.
**جی:** جێگە، جاگە ف جای، مکان.
**جێ:** ١) شوێن‌و جێگە؛ ٢) دایك ف ١) جای، مکان؛ ٢) مادر.
**جیا:** جدا، جودا، جگە ف جدا.
**جیابونەوە:** لێك هەلبڕان، جودابونەوە ف ازهم جدا شدن.
**جیاز:** ١) کورتانی وشتر؛ ٢) ئەوەی بوك بۆماڵی زاوای دەبا؛ ٣) بریتی لەکفنی مردو ف ١) پالان شتر؛ ٢) جهیزیهٔ عروس؛ ٣) کنایه از کفن.
**جیازی:** جیاز، کەل‌و پەلی بوك بۆماڵی زاوا ف جهیزیه.
**جیاکار:** جیاواز، تایەبەتی، وەك هیترنا ف جداگانه، علیحده.
**جیاواز:** جیاکار ف جداگانه. علیحده.
**جیاوەبون:** جدابونەوە ف ازهم جدا شدن.
**جیاوە کردن:** هەلاواردن، لێك جداکردن ف جداکردن.
**جیایی:** جودایی، لێك دورکەوتن ف جدایی.
**جێب:** بەریك، گیرفان، باغەل، بەرك ف جیب.
**جێباوەڕ:** جێ‌متمانە، راست‌و ئەمین ف مورد اعتماد.
**جێ‌بڕك:** جۆبڕکە، مڵە ف آبدزدك.
**جێ‌بونەوە:** لەجێگەدا حەوانەوە: (لەم‌ژورە **جێم دەبێتەوە**) ف جای گرفتن.
**جێ بەجێ:** ١) دەس بەجێ، هەرلـەجێ، هەرئێستە؛ ٢) دامەرزان‌و پێك هێنان ف ١) فوراً؛ ٢) انجام شدن.
**جێ بەجێ بون:** ١) حاوانەوە لە خانو یان لە ئاواییدا؛ ٢) پێك هاتنی کار ف ١) جاگیرشدن؛ ٢) انجام شدن.
**جێ بەجێ کردن:** پێك هێنان، کاردروست کردن ف انجام دادن.
**جێ‌پێ:** شوێن، شوێن پێ ف ردّ پا.
**جێ پێ لەقبــون:** ١) بریتی لە کەم‌و کورتی هێنــان لەپایەو مایەدا؛ ٢) نەتوانین لەشوێنی خۆدا مان ف ١) کنایه از کم آوردن پول یا مقام؛ ٢) عدم امکان ماندگار شدن.
**جێ پێ لێژبون:** جێ‌پێ لەق بون ف نگا: جێ پێ لەقبون.
**جێ پێ هەلگرتن:** شوێن گێڕان، دانەشوێن ف ردگیری.
**جیت:** جوت، بەرانبەری تاك ف زوج، مقابل فرد.
**جێت:** جێگەی تۆ: (لێرە جێت نابێ) ف جای تو.
**جێتان:** جێگەی ئێوە ف جای شما.
**جیجك:** جوچکی مەل ف جوجه.
**جێجلقانە** حندرحۆ، سیسۆ ف الاکلنگ.
**جیجە:** جوجك، بێچوە مریشك ف جوجه مرغ.
**جیچك:** جوجك ف جوجه مرغ.
**جێ خۆش کردن:** بریتی لەمانەوە لەشوێنێك بە خاترجەمی ف کنایه از آرام و قرار گرفتن با اطمینان خاطر.
**جێخون:** جۆخین ف نگا: جۆخین.
**جێ خەو:** جێگەی نوستن، شوێنی هەلاژیان، جێ رازان ف خوابگاه.
**جێدار:** ١) بەپلەو پایە؛ ٢) نوێنەر، وەکیل؛ ٣) بەرێ وجێ ف ١) ارجمند؛ ٢) نماینده؛ ٣) به جا.
**جیدانــە:** ١) کزن، دانــەوێڵەیەکە گای پێ قەڵەو دەکەن؛ ٢) سیکەتورە، سیقەتورە، چینەدان ف ١) گاودانه؛ ٢) ژاغر.
**جیر:** جیل، لاسیق، لاستیك ف لاستیك.
**جیڕ:** ١) چیڕ، خوگر و نەپس: (ئــەونــانــە زۆر جیڕە)؛ ٢) گڕدیاری دانی ددان: (ددانی لێ جیڕ کردمــەوە)؛ ٣) دەنگی دادڕینی قومــاش؛ ٤) دەنگی دەرگای ژەنگــاوی لەکردنەوەدا ف ١) کشدار؛ ٢) دندان بهم

سایيدن از خشم؛ ۳) صدای پاره کــردن پارچــه؛ ۴) صدای لولای زنگ‌زدهٔ دَر.

**جیران:** هاوسا، هاوسایه [ف] همسایه.

**جیراندن:** دەنگ لیهاتنی تەختەی لێکدراو یان دەرگای شەق‌و شڕ [ف] جیرجیر کردن.

**جیڕجیڕك:** مەشکەدڕە، سیسرك، سیسره [ف] جیرجیرك.

**جیڕدۆ:** چڕدۆ، مانگایەکی شیر دانادا [ف] گاوی که به‌آسانی شیر ندهد.

**جیڕوهوڕ:** دەنگی جیڕەجیڕی زۆر [ف] صدای جیرجیر بسیار.

**جیره:** ۱) بەشەنان‌و بژیو؛ ۲) موچەو بەرات [ف] ۱) جیره؛ ۲) مُستمری و مواجب.

**جیڕە:** دەنگی لەتەختە دروست کراوی شەق‌و شڕ [ف] جیرجیر.

**جیڕەجیڕ:** جیڕ وهوڕ [ف] جیر و ویر.

**جیرەخـۆر:** موچـەخـۆر، کەسی بەمەعاشێکی دیاری کراو کاردەکا [ف] جیره‌خوار، حقوق بگیر.

**جیرەهەر:** جیرەخۆر [ف] جیره‌خوار، حقوق‌بگیر.

**جێری:** کڵفەتی ماڵ، کارەکەر، خزمەتکاری ژن لەماڵدا [ف] کُلفَت.

**جیز:** گوێز [ف] گردو.

**جێـز:** خەرمـانی سـور، خەرمانی ئامادەکراو، کۆی خەرمان [ف] خرمن انباشته.

**جێزوك:** جەزیره، جزیره، ئاد [ف] جزیره.

**جیزه:** دەنگی زۆرباریکی مێشولەو سەماوەرو...، گیزه [ف] وزوز.

**جیزەجیز:** گیزه‌گیز، جیزەی زۆر [ف] وزوز زیاد.

**جێژن:** گێژنه، عید، عەید، جەژن [ف] جشن.

**جێژنان:** رۆژانی جەژن [ف] روزهای عید.

**جێژنانه:** خەلات‌و بەخشین لەجێژنەدا [ف] عیدی.

**جێژن ممبارەکی:** ممبارەك بادی کردن بەهۆی جێژنەوه [ف] تبریك عید.

**جێژنه:** جێژن [ف] عید، جشن.

**جێژنه پیرۆزه:** جێژن ممبارەکی [ف] تبریك عید.

**جێژنه پیرۆزی:** جێژنه پیرۆزه، جەژن ممبارەکی [ف] تبریك عید.

**جیسر:** پر، پرد [ف] پُل.

**جیق:** ۱) هەنـاو: (ئەولام تات‌و ئەم‌لام تات / وەی بابە **جیقم دەرهات**) «فـۆلکلۆر»؛ ۲) دەنگی ناچاری لە زۆربۆهاتن: (پام پیانا **جیقاندی**، بجـیقنی‌و بفیقنی پوڵ چەرمــوگم پێ داوی هەرئــەت خۆم) [ف] ۱) اندرون، امعاء و احشاء؛ ۲) صدای بخصوصی که از شدّت فشار بر سینه از گلوی آدمی درآید.

**جیق دەرهاتن:** ناوزگ‌و هەناو بڵاوبون: (ڕێکم کوشی **جیقی دەرهات**) [ف] دل و روده بیرون آمدن.

**جیقڵ:** دانی هێشتا عەزم نەکراو [ف] دانهٔ هضم نشده در چینه‌دان مرغ.

**جیقڵدان:** جێگەی دانی هەزم نەکراو [ف] ژاغر، چینه‌دان.

**جیقن:** لەڕو لاوازی کەلەلا کە بەحاڵ نوُزەی دێت [ف] لاغر و مُردنی.

**جیقنه:** ۱) جیقن؛ ۲) گوی بالندە [ف] ۱) نگا: جیقن؛ ۲) فضلهٔ پرندگان.

**جیقه:** ۱) دەنگی لاواز لە زۆر بۆهێنان‌و ڕێك کوشین؛ ۲) لاواز ولەجەری پیس؛ ۳) جوُکه، وردەدەنگی مەل [ف] ۱) صدای ضعیف آدم مُردنی؛ ۲) لاغر و مردنی؛ ۳) جیك‌جیك، آواز مرغان.

**جیقەڵدو:** جیقڵدان [ف] ژاغر، چینه‌دان.

**جیك:** ۱) دەنگی بێچـوەمـەل؛ ۲) دەنگی چۆلـەکـە؛ ۳) پانیه، پاژنـه؛ ۴) چکه، قوێره، چك، لای قوُڵی قاپ؛ ۵) جێگه [ف] ۱) صدای جوجه؛ ۲) صدای گُنجشك؛ ۳) پاشنهٔ پا؛ ۴) یك جانب قاب که با آن بازی کنند، مقابل بوك؛ ۵) جای، مکان.

**جیکاندن:** جوکەجوُك کردن [ف] جیك‌جیك کردن.

**جیکانن:** جیکاندن [ف] جیك‌جیك کردن.

**جیکڵ:** جیقڵ [ف] چینهٔ هضم نشده.

**جیکڵدان:** جیقڵدان [ف] چینه‌دان.

**جیکڵدانه:** جیقڵدانه [ف] چینه‌دان.

**جیکن:** کەم‌سەبری بەبۆڵەبۆڵ [ف] آدم ناشکیبای با غرولند.

**جیکنه:** چیکەنە، دۆلابی لۆکەرستن [ف] دوك نخ‌ریسی.

جیکه: دەنگی باریك‌و نزم [ف] صدای زیر.

**جیکەجیك:** دەنگی مەلی چکۆڵە [ف] آواز مرغان.

**جیکەنه:** جیکنه [ف] نگا: جیکنه.

**جێگر:** نایب، نوێنەر [ف] جانشین، قائم‌مقام.

**جێگه:** جێ، شوێن، جی، جاگه [ف] جای.

**جیل:** لاستیك [ف] لاستیك.

**جێڵ:** لاو، جەحێڵ [ف] جوان، برنا.

**جیلا:** جوڵا، بوُزوُکەر، شاڵباف [ف] بافنده.

**جیلاباف:** جاڵجاڵوُکە [ف] عنکبوت.

**جیلایی:** جوڵایی [ف] بافندگی.

**جیله:** جۆگەی چکۆڵە، جۆگەلە [ف] جوی باریك.

**جێ‌لەوەڕ:** لەوەڕگا، گیاجار، چایەر [ف] مرتع.

**جیم:** ۱) ناوی پیتی پێنجەمی ئەلف‌و بێتکەی کوردی؛ ۲) قسه، جواب، دەگەڵ لام دەگوترێ: (لام‌و جیم)، جوُم [ف] ۱) حرفِ جیم در الفبا؛ ۲) جواب.

**جێم:** ۱) جێگەی من، جاگەی من: (لێرەدا جێم نابێ)؛ ۲) گیرفان [ف] ۱) جای من؛ ۲) جیب.

**جێما:** بەجێ‌ما، نەگەیشتێ [ف] به‌جای ماند.

**جیماع:** گان، جوت‌بونی نێرومێ بۆناوهاتنەوه [ف] جماع، جُفت‌گیری.

**جێمان:** ۱) بەجێ‌مان، دواکەوتن، لەدواوە مانەوه؛ ۲) جێگەی ئێمه [ف] ۱) به‌جای ماندن؛ ۲) جای ما.

**جێمك:** جمك، دوانه، هاواڵ دوانه، لفه [ف] دوقلو.

**جێن:** جێگەی ئێمه، جاگەمان، شوێن خۆمان، جێمان [ف] جای ما.

**جێناو:** هێما بۆناو لە ڕێزماندا [ف] ضمیر دستوری.

**جینچـك:** هەڵتـر وشکـان، هەڵتـوتـەکـان، قونەڵتس: (ولاتنیشو هرگزاً **بالجینچك**) «مەسەل» [ف] چُمباتمه زدن.

**جینچکه:** جینچك [ف] چُمباتمه زدن.

**جینگڵ:** بزوتنەوەی کەم: (مارەکە **جینگڵی دەدا**) [ف] جنبیدن مُختصر.

**جینگن:** شەڕانی، نەگونجاو [ف] ستیزەجو.

**جینیات:** زیندوەدەلەشی پیاودا. وەك ئەسپێ‌و کێچ [ف] حشرات خانگی.

**جینۆك:** جۆرێ زیپکەولیر لەپێست [ف] نوعی جوش.

**جینێر:** هاوسا، جیران، دراوسێ [ف] همسایە.

**جێنیك:** لاجانگ [ف] موی بناگوش.

**جیو:** ژیان، ژی، هەبون [ف] زندگی.

**جێو:** گیرفان، بەرك، بەریك، باخەڵ [ف] جیب.

**جێوبان:** ئەسپابی نوستن، پێخەفی تەواو [ف] رختخواب.

**جێوبڕ:** گیرفانبڕ، بەرك بڕ [ف] جیب بر.

**جێوك:** جمك، جێمك، لفە، دوانە [ف] دوقلو.

**جیوە:** ۱) کانـزایەکـە، داناسەکنێ‌و دێت‌و دەچی، بۆ دەرمان دەبێ؛ ۲) شیرەی رەق هەڵاتوی دار، جەوی [ف] ۱) جیوە؛ ۲) انگُم.

**جیوەجیو:** ۱) دەنگی تێکەڵاوی مەلانی بچوك؛ ۲) تروکەو زریوەزریوی ئەستێران [ف] ۱) صدای درهم گنجشکان؛ ۲) سوسوزدن ستارگان.

**جیهان:** دنیا [ف] جهان.

**چ:** ١) لەجێگـــەی یان دێت: (**چبخـوازی، چنـەخـوازی**)؛ ٢) چەنـد: (**چخۆشە ئازادبون**)؛ ٣) چی بۆ پرسیار: (**چت وت**)؛ ٤) بەواتا هیچ: (**چجـاران**)؛ ٥) لەدوای وشـەوە بۆ بادانـەوەیە: (**ئەمیچ، ئەویچ**)؛ ٦) وشەی حاشا، بەواتا نە: (نۆ دەچی بۆ شار؟ چ) [ف] ١) بەمعنی یا: ٢) چقدر؛ ٣) ادات استفهام؛ ٤) هیچ؛ ٥) پسوند تکرار؛ ٦) حرف نفی.

**چا:** ١) کێو، چیا، کەژ؛ ٢) بیر، چاڵ؛ ٣) ئەوێ، وێرێ؛ ٤) چایی؛ ٥) باش: (**چابو هات**)؛ ٦) ساغ: (**چا بۆتەوە**) [ف] ١) کوه؛ ٢) چاله؛ ٣) آنجا؛ ٤) چای؛ ٥) خوب؛ ٦) سالم.

**چابك:** چوست، مەزبوت، چاپك، لەش سوك، بەپێ [ف] چابُك.

**چابـوغ:** ١) تەختـەزەوێنی سێ گۆشـە؛ ٢) پارچەپینەی بن قۆڵی کەوا، گرۆڵ [ف] ١) قطعه زمینِ مثلثی شکل؛ ٢) تکەپارچۀ زیر بغلِ قبا.

**چابوك:** چابك [ف] چابك.

**چابـــوُن:** ١) لەنـەخـۆشی خەلاس بون، چاك بونـەوە؛ ٢) لەخـراپـە دەس‌هەڵگرتن: (**ئێستە چابوە**) [ف] ١) شفا یافتن؛ ٢) ترکِ هرزگی.

**چابوُنەوە:** لەنەخۆشی هەستانەوە [ف] شفایافتن.

**چاپ:** ١) نوسینەوەی کتێب بەماشێن؛ ٢) درۆ، هەڵبەستە؛ ٣) پیاڵەیەکە بۆ پێوانە؛ ٤) شەقڵی خەرمان [ف] ١) چاپ؛ ٢) دروغ؛ ٣) نوعی پیمانه؛ ٤) مُهر خَرمَن.

**چاپاڵێو:** پارزونی چایی، کەوگیری چا پاڵاوتن [ف] چای صاف کن.

**چاپ‌باز:** درۆزن، بەفڕو فیشاڵ [ف] چاخان.

**چاپچی:** ١) کەسێ کتێب لەچـاپ دەدا؛ ٢) درۆزن‌و بافیش‌کەر [ف] ١) چاپ‌کننده؛ ٢) لافزن و دروغگو.

**چاپخانە:** ئەوشوێنە کتێب‌و ... لێ چاپ دەکەن [ف] چاپخانه.

**چاپك:** چابك [ف] چابُك.

**چاپکـردن:** ١) لەچـاپدانی نوسراو؛ ٢) بافیش‌و درۆکردن [ف] ١) چاپ کردن؛ ٢) لاف زدن.

**چاپکســوار:** ١) سوکەڵە سوار، سواری زۆر مەزبوت لەسواری دا؛ ٢) کەسێ کەئەسب بۆخەڵك تەعلیم دەدا [ف] ١) چابُك‌سوار؛ ٢) کسی که اسب تعلیم دهد.

**چاپکەر:** ئەوی کتێب چاپ‌دەکا [ف] چاپ‌کننده.

**چاپلێدان:** شات‌وشوت کردن، درۆ هەڵبەستن [ف] لاف‌زدن.

**چاپ‌وچوپ:** شات‌وشوت [ف] لاف‌و گزاف.

**چاپـەز:** ١) کەسێ کەچـای لێدەنێ؛ ٢) قۆری کەچای سەماوەری تێ دەکرێ؛ ٣) سەماوەر [ف] ١) چایچی؛ ٢) قوری؛ ٣) سماور.

**چاپەمەنی:** بەلاڤۆك، ئەوشتانەی لە چاپ دەردەچن [ف] مطبوعات.

**چات:** ١) پارچە پەڕۆی کۆنە؛ ٢) شریتی تفەنگ پاکردنەوە [ف] ١) کُهنه، لَتِ پارچه؛ ٢) نوار تفنگ پاك کنی.

**چات کردن:** پەڕاندن، چاك کردن، نیر هاویشتنە سەر مێ [ف] جفت کردن نر بر ماده.

**چاتکێش:** ئامـرازی تفـەنـگ پاکـردنەوە کە شریتی لێ دەهاڵێنن [ف] ابزاری برای پاك کردن تفنگ.

**چاتمـە:** ١) پێك هەڵپـەساردنی تفەنگان لەکاتی وچاندا؛ ٢) کێشکچی پێشمەرگە [ف] ١) چاتمه؛ ٢) قراول.

**چاتۆل:** ١) داوەڵ، داهۆڵ؛ ٢) خێوەتی تەنکی هاوینە [ف] ١) مترسك؛ ٢) خیمۀ نازُك تابستانی.

**چاتۆڵە:** خێوەتی تەنکی هاوینە [ف] خیمۀ نازك تابستانی.

**چاچك:** بنێشت، جاچکە [ف] سقز.

**چاچۆلە:** ١) شلتاغ، دەبە، تەشقەڵە، گەڕ؛ ٢) تەلیسم [ف] ١) شلتاق؛ ٢) طلسم.

**چاچەقوڵێ:** چێشتی مناڵان [ف] دست‌پُخت بچّەها.

**چاچی:** خاوەنی چایخانە، کەسێ کە چا تێدەکا [ف] صاحب قهوه‌خانه، قهوه‌خانه‌چی.

**چاخ:** ١) وەخت، زەمان؛ ٢) قەڵەو، گۆشتن؛ ٣) سازو بەکەیف: (**دەماخم چاخە**)؛ ٤) ساز و تەیارکراو: (سەبیلەکە **چاخ** کە)؛ ٥) قەباڵەی ملك [ف] ١) وقت و زمان؛ ٢) چاق؛ ٣) شاد و سرحال؛ ٤) آماده و مُهیّا؛ ٥) سند مالکیّت.

**چاخان:** درۆزن‌و بەشات‌وشوت ف دروغگو و لاف‌زن.
**چاخانوپاخان:** شات‌وشوت، درۆودەلەسە ف لاف و گزاف.
**چاخانە:** قاوەخانە، چایخانە، جێگەی چایی فرۆشتن ف قهوه‌خانه.
**چاخمـە:** گەوی کونی قایشـە پشتێند لە کانزا ف حلقه کوچك سوراخ کمربند.
**چاخوجل:** گردەلی قەلەو ف چاق و چلّه.
**چاخەوکردن:** قەلەوکردنی حەیوانی گۆشت ف پرورش دام.
**چادان:** چایدان، قۆری، چاپەز ف قوری.
**چادر:** کۆن، رەشماڵ، تاوڵ ف چادُر.
**چادران:** زوم، هۆبـــە، کۆمـەڵی رەشمـاڵ بەدەوری یەکـا ف اجتمـاع چادرهای فراوان گردهم.
**چادرنشین:** کۆچەر، گەرمێن کوێستان‌کەر، خێڵەکی ف چادُرنشین.
**چار:** ۱) مەڕی رەشی گوێ سپی؛ ۲) روبەندی ژنانە؛ ۳) دەرەتان، چارە؛ ۴) ژمارەی چوار؛ ۵) مەڕی رەش؛ ۶) دەسرۆکەی نیشانەی بوکێنی؛ ۷) دەم‌وچـاو، بیچم ف ۱) گوسفنـد سیاه سفیدگوش؛ ۲) روبند؛ ۳) چاره؛ ۴) چهار؛ ۵) گوسفند سیاه؛ ۶) دستمال عروس؛ ۷) سیما.
**چارانچەقیلە:** چارەچەقیلە، خاشخاشك، رەبەنۆك ف نوعی خشخاش.
**چارانە:** جلکێکی شەڕکەران بوە، چوارئاوێنە ف چهار آیینه.
**چارپا:** تەختی لەسەرنوستن ف تختخواب.
**چارپایە:** چارپا ف تختخواب.
**چارپێ:** ۱) ئاژاڵە بەرزە، رەشەماڵ؛ ۲) سەگی پاس ف ۱) دام؛ ۲) سگ نگهبان.
**چارپێچی:** چەرچی، دەسفرۆشی گەڕیدە ف پیله‌ور.
**چارچار:** چوارڕۆژی ئاخری چلەی چۆکە ف چهار روز آخر چلّه.
**چارچاڤ:** ۱) بریتی لە وشیاری‌و ئاگاداری زۆر؛ ۲) سەرلێ شێواو ف ۱) کنایه از هشیاری کامل؛ ۲) سرگردان.
**چارچمبل:** چوار هەنگڵ، کوپەی چواردەسك ف خُم چهاردسته.
**چارچەش:** چارچاف ف نگا: چارچاف.
**چارچەقلی:** خرمچون، هەرچوارپەل ف چهار دست و پا.
**چارچەك:** پڕچەك ف سَلَحشور.
**چارچیق:** زەوینی زۆنگ ف زمین باتلاقی.
**چارچێوە:** داری دەوری دەرك‌و پەنجەرە ف چهارچوب در و پنجره.
**چاردارە:** تابوت، داربەست ف تابوت.
**چارداغ:** کۆخی ناوبێستان‌و مەزرا ف کرچه.
**چارداوەرو:** ۱) مەڵبەندێکە لە کوردستان؛ ۲) بریتی لەمرۆی بێ‌شەرم ف ۱) منطقه‌ای در کردستان؛ ۲) کنایه از آدم بی‌شرم.
**چاردە:** دەوچوار ف چهارده.
**چارڕێك:** جەمسەری دوریگەی تێك‌پەڕیو ف چهارراه.
**چارشۆ:** ۱) چارشێو، ئەوجاجمەی نوێنی تێوە دەپێچرێ؛ ۲) عەبای ژنانە ف ۱) چادرشب؛ ۲) چادر زنانه.
**چارشەم:** چوارشەمۆ ف چهارشنبه.
**چارشەمب:** چارشەم ف چهارشنبه.

**چارشەمبۆ:** چارشەم ف چهارشنبه.
**چارشەمبی:** چارشەم ف چهارشنبه.
**چارشەو:** چارشۆ ف نگا: چارشۆ.
**چارشێو:** چارشۆ ف نگا: چارشۆ.
**چارك:** ۱) برینگ؛ ۲) چواریەك ف ۱) قیچی پشم‌چینی؛ ۲) چارك، ربع.
**چاركولۆل:** پەزی ئەنی‌رەش‌و گوێ‌سپی ف گوسفند پیشانی سیاه گوش سفید.
**چارگاڤی:** چوارناڵە ف چهارنعل.
**چارگۆشە:** چوارسوچ ف مُرَبَع.
**چارمەشقە:** دانیشتنی پانەوپان ف چهارزانو نشستن.
**چاروا:** چارەوێ ف چهارپا.
**چاروادار:** ولاخــدار، کەسێ کە بارەبـــەر بەکـــرێ دەدا ف کسی که چهارپایان را کرایه می‌دهد.
**چارۆك:** قوماشێ کەژنان بەسەر شانی‌دا ئەدەن ف رودوشی زنانه.
**چارۆکە:** ۱) چارۆك؛ ۲) گیایەکە؛ ۳) مناڵدان ف ۱) رودوشی زنانه؛ ۲) گیاهی است؛ ۳) زهدان.
**چاروە:** چەقەنە کە دەپەنجە دەکرێ ف صنج.
**چاروەدار:** ولاخدار ف چاروادار.
**چارویدار:** ولاخدار ف چاروادار.
**چارە:** ۱) بیچم‌و نەرح؛ ۲) بەخت؛ ۳) دەرەتان ف ۱) سیما؛ ۲) شانس؛ ۳) چاره.
**چارەچەقیلە:** چارانچەقیلە ف نوعی خشخاش.
**چارەرەش:** کلۆڵ، بەدبەخت، بێ‌سعود ف بدبخت.
**چارەسەر:** رێی نەجات، دەرەتان ف راه‌حل.
**چارەك:** لەچواربەش بەشێك ف رُبع.
**چارەکە:** چارۆك ف نگا: چارۆك.
**چارەگ:** چارەك ف یك چهارم.
**چارەگە:** چارۆك ف نگا: چارۆك.
**چارەنوس:** بەخت‌وهات ف سرنوشت.
**چارەوا:** چاروا ف چهارپا.
**چارەوێ:** ولاخی سواری‌و باری ف چهارپا.
**چاری:** چارەك ف یك چهارم.
**چاریار:** جەژنێکی ئەهلی حەقە، جێژنێکی کاکەییەکانە ف یکی از اعیاد اهل حق.
**چاریارو:** کێوێکە لە لوڕستان ف از کوههای لُرستان.
**چاریچی:** چەرچی، دەسفرۆشی گەڕیدە، چارپێچی ف پیله‌ور.
**چاریك:** بەشێك لە چواربەش ف یك چهارم.
**چارین:** شیعری چوارلەتە، روباعی، چوارخشتەکی ف رُباعی.
**چاری ناچار:** خوایی ناخوایی، نەچاری، مەجبوری ف ناگُزیر.
**چازو:** فێڵباز، گەڕساز، گزیکار ف حیله‌گر.
**چاژ:** چێژە، تام ف مَزّه.
**چاسر:** ۱) پاسارەی بان، گوێسوانە؛ ۲) پارسەکی ماڵانگەڕ ف ۱) لبهٔ بام؛

٢) گدا.

**چاش:** ١) شاش، سەرگەردان، پەشـێواو؛ ٢) چێژە ف ١) سرگردان، هاج‌وواج؛ ٢) مَزّه.

**چاشاندن:** چێژتن، تام کردن ف چشیدن.

**چاشبون:** سەرلێ شێوان، بەهەلەچون ف سرگردانی.

**چاشت:** ١) چێشتـەنگـاو، قاوەڵتـون، نێوان بەیان‌و نیمـەڕۆ؛ ٢) نانی قاوەڵتون ف ١) چاشت؛ ٢) غذائی که بهنگام چاشت خورند.

**چاشتی:** لەگوێن، وەکو، لەرەنگی ف همانند.

**چاشتینگا:** چێشتەنگاو، نێوان بەیان‌و نیمەڕۆ ف چاشت.

**چاشنی:** ١) چێژە لە چێشت؛ ٢) چەشنی، تورەقە ف ١) چاشنی؛ ٢) ترقه.

**چافك:** جۆرێ کوانی بەبلۆق ف دُمل تاول زده.

**چافكەر:** چاوپیس ف شورچشم.

**چاڤ:** چاو، دیده، دیه، چەم ف چشم.

**چاڤا:** جۆن، چلۆن، کو ف چگونه، چطور.

**چاڤ برچى:** تەماح‌کار، چاونەزێر، چاوچنۆك ف آزمند.

**چاڤ تارى:** چروك، رژد، دەس قوچاو، چکوس، نان‌نەخۆر ف خسیس.

**چاڤتێر:** بوده، بێ‌نیاز ف بی‌نیاز.

**چاڤچنۆك:** ١) چاڤ برچی؛ ٢) بەئێرەیی ف ١) آزمند؛ ٢) حسود.

**چاڤ چیچك:** جۆرێ ترێ ف نوعی انگور.

**چاڤ چیلك:** گیایەکە ف گیاهی است.

**چاڤ دان:** چاوەدێری، سەرپەرشتی، ئاگالێ بون ف نظارت.

**چاڤ دانان:** چاودەبەری، منەکێشان ف مِنّت کشیدن.

**چاڤ دزەکێ:** بۆ هەل‌و دەرفەت روانین ف پی فرصت گشتن.

**چاڤ دێر:** چاوەدێر ف ناظر.

**چاڤ رەشۆك:** گیـایەکـە گـەڵاکانی زۆرجـوان‌و رەنگاورەنگە ف گیاهِ حُسن یوسُف.

**چاڤرى:** چارەوێ، رەشەولاخ، ولاخەبەرزە ف به یابو و قاطر گویند.

**چاڤ زەق:** چاودەرپەڕیو ف چشم برآمده.

**چاڤ سست:** ١) ترسەنۆك، بێ‌غیرەت؛ ٢) بێ‌ئابرو ف ١) ترسو؛ ٢) بی‌آبرو.

**چاڤسۆر:** چاوسور، خەڵك ترسێن، بەهەیبەت‌و مەترسی ف هراسناك.

**چاڤ شكاندن:** چاوداگرتن، هێمابە گۆشەی چاوکردن ف چشمك زدن.

**چاڤشۆر:** فهێکار، فەدیکار، شەرمەزار، خەجاڵەت، تەریق ف شرمنده.

**چاڤ ڤەكرى:** ١) زیرەك، تێگەیشتو؛ ٢) دلاوا، بەخشندە ف ١) آگاه؛ ٢) دست و دلباز.

**چاڤك:** گوێزلك، چاویلکە، عەینەك ف عینك.

**چاڤكز:** چاوپروش ف کسی که چشمانش بیمار است.

**چاڤكوسكانێ:** بەزەقی روانین، زەق تێ‌روانین ف خیره نگریستن.

**چاڤ گرتن:** چاوپۆشین، بوردن، ویەردن ف چشم‌پوشی.

**چاڤ گرێداى:** چاوبەستە، کوێرکوێرانە ف چشم‌بسته.

**چاڤگـە:** ١) دەستـەچیلە، کەرستـەی سەرەتـایی بۆ ئاگرهەڵکردن؛ ٢) بنەمای وشە، مەسدەر ف ١) افروزه؛ ٢) مَصدر.

**چاڤ لدەر:** ١) چاوزەق؛ ٢) چاوحیزو ژنباز ف ١) چشم برآمده؛ ٢) هرزه‌کار.

**چاڤ لێكرن:** لاسا، چاولێکەری ف تقلید.

**چاڤمار:** چاوتیژ، چاورۆن ف تیزبین.

**چاڤ ماسى:** گیایەکە ف گیاهی است.

**چاڤ نەرم:** ژنی خۆ زو بەدەستەوە دە ف زنی که می‌شنگد.

**چاڤنێر:** چاوەنۆڕ، چەمەڕا ف منتظر، چشم به‌راه.

**چاڤنێرى:** چاوەنواڕی ف اِنتظار.

**چاڤۆك:** بەرچاوکەی ئەسپ ف چشم بندِ اسب.

**چاڤەگا:** گیایەکە ف گیاهی است.

**چاڤ هیشك:** بێ چاوەڕو، بێشەرم‌و شورەیی ف پُررو، بی‌شرم.

**چـاڤینۆك:** ١) بەئێـرەیی، چـاونەزێر؛ ٢) چاوپیس ف ١) حسود؛ ٢) شورچشم.

**چاق:** ١) پاق، لینگ، لاق؛ ٢) قەڵەو، تێرگۆشت ف ١) لنگ، پا؛ ٢) چاق.

**چاقا:** لەوساوە، لەچاخێکەوە، لەودەمەوە ف از آن هنگام.

**چاقۆ:** چەقو، کێر، کێرد ف چاقو.

**چاك:** ١) باش، قەنـج؛ ٢) داوێن؛ ٣) قەڵش‌و دەرز؛ ٤) گۆڕی پیرۆزی پیاوچاکان ف ١) خوب؛ ٢) دامن؛ ٣) شکاف، درز؛ ٤) مَزار.

**چاك‌بون:** ١) لەنەخۆشی هەستانەوە؛ ٢) باش‌بون لەدوای خراپەکردن ف ١) شفایافتن؛ ٢) دُرُستکار شُدن.

**چاك بەلاداكردن:** داوێن بەلادا کردن، شاقـەل هەڵازنین ف انتهـای دامن را به گوشهٔ کمر بستن.

**چاك بين:** دڵرۆن، هزرباش ف خوشبین.

**چاكردنەوە:** لێکدراو یان شکاو سازکردنەوە ف مرمَّت و تعمیر.

**چاكرنەوە:** چاکردنەوە ف مرمَّت و تعمیر.

**چاك كردن:** ١) چاکـرنـەوە؛ ٢) ماین‌و ماکـەر لەفـەحل کێشان ف ١) مرمت؛ ٢) مادیان و ماده خر را گُشَن دادن.

**چاك كردنەوە:** چاکرنەوە ف تعمیر.

**چاكڵ:** دارێکی ئالقەی سەری گوریسە ف وهنگ.

**چاكڵە:** چاکڵ ف وهنگ.

**چاكوپير:** گۆڕی زیارەتگا ف مزار.

**چاك‌وچۆنى:** حاڵ‌و حەواڵ پرسین، چاك وخۆشی ف اَحوال‌پرسی.

**چاكوچ:** چەکوچ، چەکوش ف چکُش.

**چاكوخۆشى:** چاك‌وچۆنی ف اَحوالپرسی.

**چاكە:** پیاوەتی، مرۆڤایەتی ف خوبی، نکوئی.

**چاكەت:** کۆت، پارچەجلکی سەرەوەی پیاوانە ف کُت.

**چاكەل:** شاقەل، لاداوێن ف حاشیهٔ دامن.

**چاكەڵ:** چاکەل ف حاشیه دامن.

**چاكى:** باشی، پیاوچاکی، پەسندی ف خوبی، نکوئی.

**چاكێتى:** چاکە، باش‌بون ف نیکی.

**چاگە:** ئەویّ، ویدەری [ف] آنجا.

**چاڵ:** جەواڵ، جواڵ [ف] جوال.

**چاڵ:** ١) قوڵکـەی گەورە بوّ دەغـڵو بەفر؛ ٢) قوپاو، روّچو؛ ٣) پوش: (چیلکەو **چاڵ**) [ف] ١) چاله؛ ٢) فر ورفته؛ ٣) خاشاك.

**چالاغ:** چەموش، توُش، رەوەك، سرك، سڵ [ف] چموش.

**چالاڤ:** بیر، چاڵاو [ف] چاه آب.

**چالاك:** چوست، مەزبوت، بەکار، لەش سوك [ف] چالاك.

**چاڵان:** ماتێن، هەڵماتێن، کەللا دەقوڵکە خستن بوّگەمە [ف] تیله‌بازی.

**چاڵاو:** بیر [ف] چاه آب.

**چاڵایی:** قوڵکە، روّچواوی زەمین [ف] فر ورفتگی در زمین.

**چالخەم:** چەقەڵماست، ماستاو [ف] دوغ چر بی نگرفته.

**چالك:** ١) دینگ بوّ چەڵتوك کوتان، دەسکوسندوّڵ؛ ٢) کورّەبەش [ف] ١) دَنگ، ابزار شلتوك کوبی؛ ٢) گورکن.

**چالگ:** کورّەبەشە، چوالو [ف] گورکن.

**چاڵمە:** ١) کیسەتوتن؛ ٢) سەحاتێ کەپیاو خەبەردەکاتەوە [ف] ١) کیسۀ توتون؛ ٢) ساعت شماطه‌دار.

**چالو:** چالەکە، کورّەبەش [ف] گورکن.

**چاڵوچوّڵ:** زەوینی پرّ لەقوُڵکە، زەمینی نارێکو ناصاف [ف] زمین ناهموار.

**چـاڵوُك:** داروُکەیـەکی درکاوی سپی‌یە بوّ تەندورو ئاگر دەکاردێ [ف] سفیدخار.

**چاڵوێنەك:** قوُلکەی سواغ دراو بوّ ئاوتێدا خواردنەوەی سەگ [ف] گودالی که برای آب خوردن سگ اختصاص دهند.

**چالە:** کورّەبەش، چوالو [ف] گورکن.

**چاڵـەبەفر:** جێگەی قوڵو بەرنزار لەچیا کە بەفری تاهاوین دەمێنێ [ف] یخچال طبیعی.

**چاڵەچەقیلە:** چارە چەقیلە، رەبەنوّك [ف] نوعی خشخاش.

**چاڵەقوتە:** مات، قوُلکەی چکوّڵە بوّ هەڵماتێن [ف] گودال کوچك در تیله‌بازی.

**چاڵی:** ١) قوُلایی؛ ٢) قوُپاوی [ف] ١) گودی؛ ٢) فر ورفتگی.

**چاڵی‌چـەنـە:** کوُری ئەرزینـگ، قـوُڵایی ناوەراستی چەناگە [ف] چاه زنخدان.

**چاڵێن:** ماتێن. هەڵماتێنی ناو قوُڵکە [ف] تیله‌بازی.

**چام:** ١) بەڵاو نسیبەت؛ ٢) قوڵکەو بەرزایی سەرریگە؛ ٣) خواری‌و پێچ؛ ۴) جوّرێ دار کە دارتـــاش دەکـاری دێنن [ف] ١) بلا و مُصیبَت؛ ٢) پستی و بلندی راه؛ ٣) پیچ و خم؛ ۴) نوعی چوب نجاری.

**چام چام:** ١) ریگەی بەکەندو کلوّ؛ ٢) ریگەی بەپێچو خوارەکەو پێچەکە [ف] ١) راه ناهموار؛ ٢) راه پر پیچ و خم.

**چان:** ١) ئامـــرازێکـــە بوّ گێرەی کلّوش، باگوردێنی لەدار بەدارێکـەوە دەبـەستن‌و دەملی گای دەکـەن، باگردانـەکان بەسەر کلّوش‌دا دێن وردی دەکـەن؛ ٢) جەنجـەرّ؛ ٣) شتێکی سێ‌سوچە لەشول چندراوە وەك بێڵ دەچی، پرّوپـوش‌و لیتـەی جوّگەی پێ دەمـاڵن، ئامـرازی جوّماڵ لە چەپەر؛ ۴) زەنگوڵەی خەبەردارکردن، زیل [ف] ١) جَوَن؛ ٢) چرخ خرمنکوب؛ ٣) لجن‌روب دستی؛ ۴) زنگ اخبار.

**چاند:** سیوات، خوێندەواری، روّشن بیری [ف] فرهنگ.

**چانـدن:** ١) توّ بەزەویەوە کردن؛ ٢) چەقـانـدنی شەتـڵو نەمام [ف] ١) بذرافشاندن؛ ٢) کاشتنِ نهال.

**چاندنی:** شیاوی چاندن، چێنراو [ف] کاشتنی.

**چانکـوّچ:** راوەشاندنی زەنگوڵە بوّ کاروان کە وەختی کوّچە [ف] بەصدا درآوردن زنگ کاروان بەعلامت رفتن.

**چانکوش:** مجێوری کلیسای فەلان بوّ ناقوس راژاندن [ف] خادم کلیسا برای زدن ناقوس.

**چانن:** چاندن [ف] نگا: چاندن.

**چانە:** ١) ئەویّ، وێدەرێ؛ ٢) گەسکی لەشوُڵ بوّبن خەرمان ماڵین [ف] ١) آنجا؛ ٢) نوعی جارودستی.

**چاو:** ١) پارەیەکی مغولەکان؛ ٢) چەم، چاو، چەعف؛ ٣) برّوانە، تواشاکە؛ ۴) خەبـەری مەرگ کە لە دورەوە هاتبێ [ف] ١) واحد پول مغول؛ ٢) چشم؛ ٣) نگاه کُن؛ ۴) خبر مرگ عزیز دورافتاده.

**چاوا:** چلوّن؟، چوّن؟، کو؟ [ف] چطور؟.

**چاوان:** ١) چلوّن، کو؛ ٢) هەردوچاو [ف] ١) چگونه؛ ٢) دو چشم.

**چاوانە:** ١) چاڵاو، بیر؛ ٢) چوّنە، چتوّیە [ف] ١) چاه آب؛ ٢) چگونه است.

**چاوئێشە:** ژانی چاو، نەخوّشی چاو، چاڤ کولی [ف] چشم‌درد.

**چاوبـاز:** ١) چاوچـرّێن، نەزەربـاز؛ ٢) برێتی لەژنی چاوجـوان [ف] ١) چشم‌چران؛ ٢) کنایه از زیباچشم.

**چاوبازە:** گیایەکە درك‌دار، گیایەکی بەچقڵە [ف] گیاهی است خاردار.

**چاوبازی:** چاو چرّاندن، چەم چەرّاندن [ف] نظر بازی.

**چاوباشقال:** چاوچرّێنی فاسق، چاوحیز [ف] چشم‌چران.

**چاوبرّ:** برینگەری چاوان، ئەوکەسەی پیلو دەبرّێ [ف] جرّاح چشم.

**چاوبرسی:** تێرنەخوّر، چکوس، چاوچنوّك، چاڤ‌برچی [ف] حریص.

**چاوبرّکە:** بەچاو یەکتر حاڵی کردن، نێك گەیشتن بەتماشا [ف] سخن به اشارت گفتن.

**چاوبرّکێ:** چاوبرّکە [ف] نگا: چاوبرّکە.

**چاوبرّین:** زیدەگوّشت برّینی پیلو [ف] جراحی چشم.

**چاوبز:** ١) چاوزەق، چاودەرپەرّیو؛ ٢) گزوفت [ف] ١) چشم برجسته؛ ٢) کسی را حسرت دادن.

**چاوبزکردنەوە:** بەزەقی روانین بوّ ترساندن [ف] چشم غُرّه رفتن.

**چاوبوّرە:** گیایەکی درکاوی‌یە [ف] گیاهی است.

**چاوبوّق:** چاو دەرپەرّیو، چاوزەق [ف] چشم برآمده.

**چاوبەرەژێر:** ١) بەرباری منەت؛ ٢) تەریق، فهێدکار، خەجاڵەت [ف] ١) مِنّت‌کش؛ ٢) شرمنده.

**چاوبەس:** دەسبرّ، فێڵباز، خاپینوّك، خەڵەتێن [ف] حیله‌گر.

**چاوبـــەست:** ١) چاوبـەس؛ ٢) دەسـرەیەك کە لە گەمـەدا چاوی پێ دەبەستن [ف] ١) حیله‌گر؛ ٢) پارچه‌ای که با آن چشم را بندند.

**چاوبـەڵـەك:** چاورّەشی سپی پێست [ف] کسی که چشم سیاه و پوست

سفید دارد.

**چاوبەن:** چاوبەست [ف] نگا: چاوبەست.

**چاوبەند:** چاوبەست [ف] نگا: چاوبەست.

**چاوپشکوتن:** چاوتروکانن، دەس بەدیتن کردنی بەچکەی جانەوەر [ف] چشم باز کردن و دیدن نوزاد حیوانات.

**چاوپشیلە:** گیایەکە لە چاوی کتك دەکا [ف] گیاهی است شبیه چشم گربه.

**چاوپۆشان:** لێ بوردن، چەم پۆشی [ف] چشم‌پوشی.

**چاوپۆشی:** چاوپۆشان [ف] چشم‌پوشی.

**چاوپۆشین:** چاوپۆشان [ف] چشم‌پوشی.

**چاوپەڕین:** لەرزەی پەلکی چاو، پیلو لەرزین [ف] لرزش پلك، چشم پریدن.

**چاوپیاخشاندن:** بەسەرچلی تێ روانین [ف] سرسری نگاه کردن.

**چاوپیس:** چاڤینۆك، کەسێ کە بەچاوەوە دەکا [ف] چشم شور.

**چاوپێ کەفتن:** تۆش هاتن، دیتن [ف] دیدن.

**چاوپێ کەوتن:** چاوپێ کەفتن [ف] دیدن.

**چاوپێ هەڵنەهاتن:** ۱) بریتی لە شەرم لێ کردن؛ ۲) رك لێ بونەوە [ف] ۱) شرم کردن؛ ۲) دشمنی کردن.

**چاوپێ هەڵێنـان:** بریتی لە بەچاوەوە کردن، ئیرەیی پێ بردن [ف] چشم زخم زدن، حسادت.

**چاوتاریك:** بریتی لە کەسێ دواڕۆژ بەخراپ دەزانێ، بەهیچ دڵخۆش نە [ف] بدبین.

**چاوتاریك بون:** بریتی لە رق هەستانی زۆر [ف] کنایە از خشمگین شُدن.

**چاوترسێن:** پەند وەرگرتو، تەنبێ بو [ف] درس عبرت گرفته.

**چاوتروکاندن:** لێکدانی پیلو [ف] برهم زدن پلکها.

**چاوتروکانن:** چاو تروکاندن [ف] نگا: چاوتروکاندن.

**چاوتروکانێك:** ماوەیەکی یەکجار کەم: (**بە چاو تروکانێك** دەت گەمێ) [ف] زمان یك چشم بەهم زدن.

**چاوترە کاندن:** چاوتروکاندن [ف] نگا: چاوتروکاندن.

**چاوترە کانن:** چاوتروکاندن [ف] نگا: چاوتروکاندن.

**چاوتوند:** چاوقایم [ف] نگا: چاوقایم.

**چاوتەنگ:** رژد، چکـوس، دەس قوچـاو، بەئیرەیی، چـاونەزێر [ف] چشم‌تنگ.

**چاوتێ بڕین:** ۱) تەماح تێ کردن؛ ۲) لێ مۆڕ بونەوە [ف] ۱) چشم طمع دوختن بە؛ ۲) چپ‌چپ نگاه کردن بە.

**چاوتیژ:** چاورۆن [ف] تیزبین.

**چاوچاو:** ببینە چەند جوانو سەیرە [ف] بنگر.

**چـاوچڵـە:** ۱) چاوپیس؛ ۲) نوشتەی چاوزار [ف] ۱) چـشم‌شور؛ ۲) چشمارو.

**چاوچڵێس:** چاوحیز، کەسێکە بێ‌شـەرمـانە بۆ ژنان دەڕوانێ [ف] چشم‌چران.

**چاوچنۆك:** ۱) بەتەماح؛ ۲) بەئیرەیی، چاونەزێر [ف] ۱) آزمند؛ ۲) حسود.

**چاوچوڕیاگ:** چاو داقڵیشاو، کەسێ پیلوی هەڵگەڕاونەوە [ف] پلك برگشته.

**چاوچونەخەو:** چاو خەواڵو بون، تازەنوستن [ف] تازه بخواب رفته.

**چاو چەپوچێڵ:** خێل، خوێل [ف] لوچ.

**چاوچێڵ:** خێل، یەك بەدو بین [ف] لوچ.

**چاوحیز:** ئەوی بەغەیانەت لەژنی خەڵك دەڕوانێ [ف] چشم زال.

**چاوحیزکـــردن:** سەرداخستن، لەشـــەرمـان چاوداخستن [ف] سر بزیر انداختن از شرم.

**چاوداخستن:** سەر هەڵنەهێنان لە شەرمان [ف] سر بزیر انداختن از شرم.

**چاودار:** ۱) چێودان، گیایەکــە وەك گەنمو لەنـــاو گەنمـــا دەڕوێ؛ ۲) چاوەنێر، ئاگاداری بەچاو [ف] ۱) چاودار؛ ۲) زیرنظر گرفتن.

**چاوداگرتن:** سوچی چاو تروکاندن بۆ تێگەیاندنی مەبەستێك [ف] چشمك زدن.

**چاوداگرسان:** سورهەڵگەڕانو ژانی چاو [ف] چشم بەدرد آمدن.

**چاوداگریسان:** چاوداگرسان [ف] نگا: چاوداگرسان.

**چاوداگیرسان:** چاوداگرسان [ف] نگا: چاوداگرسان.

**چاوداگیرسێن:** دەستە چیلەی ئاگر [ف] افروزه.

**چاودانەسەر:** تەماح تێ کردن، لێ روانین بەتەمایەکەوە [ف] چشمِ طَمَع دوختن بە...

**چاودەر پەڕاندن:** زەق تواشاکردن بۆ ترساندن [ف] چشم‌غُرّه رفتن.

**چاودێر:** چاولەشتێ بۆ ئاگالێ بون [ف] ناظر.

**چاوڕاو:** ۱) شاتو شوت، درۆو هەڵبەستە؛ ۲) خۆ هەڵکێشان وبافیش [ف] ۱) لافو گزاف؛ ۲) خودستایی.

**چاوڕشتن:** کل دەچاوکردن، سورمە دەچاوکێشان [ف] سُرمەکشیدن.

**چاوڕو:** شەرم، حەیا. فهێت. فەدی [ف] شَرم.

**چاوڕوان:** چاونۆڕ، چەهقنێر، چەمەڕا [ف] چشم بەراه.

**چاوڕۆشن کەرە:** ۱) دەستەچیلەی ئاگر؛ ۲) دیتنی شتی دڵخۆش کەرە [ف] ۱) افروزه؛ ۲) خوشحال کننده.

**چاوڕۆشنی:** ۱) مژدەی خۆش؛ ۲) دیتنی کەسێ یاشتێ کە ئارەزو دەکرا [ف] ۱) مژده؛ ۲) چشم روشن شدن.

**چاوروگە:** گیای زمانەگا [ف] گیاه گاوزبان.

**چاورونی:** ۱) پیرۆزبایی؛ ۲) مژدەی خۆش؛ ۳) دیتنی خوشەویست [ف] ۱) تبریك؛ ۲) مژده؛ ۳) دیدار عزیز.

**چاوڕەش:** سیاچەم [ف] سیاه‌چشم.

**چاوری:** ۱) چارەوێ؛ ۲) شەرم، چاوڕو [ف] ۱) چارپا؛ ۲) آزرم.

**چاوزار:** بەچاوی پیسەوەبون [ف] چشم زخم دیدن.

**چاوزەق:** چاودەرپەڕیو [ف] چشم برآمده.

**چاوساخ:** دەسکێشی کوێر [ف] آنکه شخص نابینائی را راهنمائی کند.

**چاوساغ:** چاوساخ [ف] نگا: چاوساخ.

**چاوسپی بون:** بریتی لەمردن: (**چاوت سپی** دەکەم) [ف] کنایە از مردن.

**چاوسپیلکە:** گیایەکی دڕکاویە [ف] گیاهی خاردار است.

**چاوسۆتك:** چاوپیس، چاڤینۆك [ف] چشم‌شور.

**چاوسور:** برێتی لە پارێزەر، سەرپەرشت، خەمخۆر ف طرفدار و غمخوار.

**چاوسوُرکردنەوە:** ترساندن، هەڕەشەکردن، هەڕوگیف ف تهدید.

**چاوسوُری:** ئازایەتی، نەترسی ف شجاعت.

**چاوشارکێ:** گاڵتەیەکە چاو دەبەستن و دەبێ بەچاوبەستراوی هاوگەمە بدۆزێتەوە ف بازی چشم‌بندك.

**چاوشارەکێ:** چاوشارکێ ف بازی چشم‌بندك.

**چاوشاش:** خێل، خوێل ف لوچ.

**چاوشکان:** ۱) ترسان، نەترەچوُن؛ ۲) پەند وەرگرتن و تەمێ بوُن ف ۱) ترسیدن؛ ۲) متنبّه شدن.

**چاوشکاندن:** ۱) ترساندن؛ ۲) سوكو چروك كردن؛ ۳) چاوداگرتن ف ۱) ترسانیدن؛ ۲) هتك حرمت كردن؛ ۳) چشمك زدن.

**چاوشلکانێ:** چاوشارکێ ف بازی چشم‌بندك.

**چاوشۆر:** شوُشەی تایبەتی چاوی ئێشاو شوتن ف چشم‌شوی.

**چاوشۆڕ:** خەجاڵەت، تەریق، فەدیکار ف شرمندە.

**چاو شۆڕ کردنەوە:** لەبەر پەشیمانی سەرداخستن ف سر بزیر از ندامت.

**چاوشۆڕی:** فهێت کاری، شەرمەزاری، خەجاڵەت‌باری ف شرمساری.

**چاوشێرکانێ:** چاوشارکێ ف بازی چشم‌بندك.

**چاوشین:** چاوکەوە ف زاغ‌چشم.

**چاوفڕین:** چاوپەڕین ف پریدن پلك چشم.

**چاوقایم:** ۱) بێ‌شەرم، بەڕو، ڕوقایم؛ ۲) نەترس، بەغیرەت ف ۱) چشم دریدە؛ ۲) نترس و دلیر.

**چاوقرتانن:** چاوبڕکە ف چشمك زدن.

**چاوقرتکێ:** چاوبڕکێ ف چشمك‌زدن.

**چاوقوچاندن:** ۱) چاولێك نان، چاو لەسەریەك دانان، پەلك داخستن؛ ۲) برێتی لەچاوپۆشین لەکارێ؛ ۳) خۆدزینەوە لەکار ف ۱) چشم برهم نهادن؛ ۲) کنایە از چشم‌پوشی کردن؛ ۳) از زیر کاری در رفتن.

**چاوقوچانن:** چاوقوچاندن ف نگا: چاوقوچاندن.

**چاوقوُڵ:** کەسێ چاوی چاڵترە لەچاوی ئاسایی ف چشم فرورفتە.

**چاوقوُڵکە:** تاعون، درمی ڕشانەوە ف وَبا.

**چاوقونجاندن:** چاوقوچاندن ف نگا: چاوقوچاندن.

**چاوکراوە:** لەدنیازان، تێگەیشتو ف دانا، فرزانە.

**چاوکردن:** وەبەرچاو هاتن، بەچاو دیتن ف بەچشم دیدن.

**چاوکز:** پروش، کەم بین ف دارای چشم کم‌سو.

**چاوکـردنەوە:** برێتی لە ئاگاداربون لەدنیاو ناسینی خەڵك ف کنایە از اطراف خود را شناختن.

**چاوکسکە:** جۆرە ترێیەکی سپی‌یە لەبوڵ مازو دەکا ف نوعی انگور.

**چاوکوتکە:** گیایەکە گەڵاخر، گوڵی زەردە ف گیاهی است با گُلهای زرد.

**چاوکە:** ۱) بڕوانە، تواشاکە، بنهێرە، مەیزێ، فت کرێ؛ ۲) دەسەچیلەی چاوەی ئاگر ف ۱) بنگر، نگاه کن؛ ۲) افروزە.

**چاوکەرەشێرە:** گیایەکە تۆمێکی سور دەکات ف گیاه چشم خروس.

**چاوکەڵەشێرە:** چاوکەرەشێرە ف نگا: چاوکەرەشێرە.

**چاوگ:** ۱) دەستەچیلە؛ ۲) وردەئاگر لە کوانودا؛ ۳) بنەمای وشە ف ۱) افروزە؛ ۲) بازماندهٔ اخگر در آتشدان؛ ۳) مَصدَر.

**چاوگا:** چاوگەورە ف گاوچشم، فراخ‌چشم.

**چاوگل‌بوُن:** توُشی چاوئێشە هاتن ف مبتلا بە چشم درد شدن.

**چاوگلۆفین:** گوشینی چاوان بەدەس ف چشمان را با دست فشردن.

**چاوگە:** ۱) دیمەن؛ ۲) سەچاوەی‌کانی؛ ۳) دەستەچیلە؛ ۴) دەمی برین ف ۱) منظرە، چشم‌انداز؛ ۲) سرچشمە؛ ۳) افروزە؛ ۴) دهانهٔ زخم.

**چاوگە داکەوتن:** قوُڵ‌بونی برین ف عمیق بودن زخم.

**چاوگەڕاندن:** چاوگێڕان، بەولاولادا ڕوانین ف بهر سو نگریستن.

**چاوگەڕانن:** چاوگەڕاندن ف نگا: چاوگەڕاندن.

**چاوگەرم کردن:** برێتی لە سوکەخەوکردن ف چُرت زدن.

**چاوگێڕان:** چاوگەڕاندن ف نگا: چاوگەڕاندن.

**چاوڵە:** بزوُت، ئەخترمە، چلوُسك ف نیم‌سوز.

**چاولەدو:** بەئاواتی، بەتەمای ف اُمّیدوار.

**چاولەدوا:** چاولەدو ف اُمّیدوار.

**چاولەدەست:** ۱) ئاتاج؛ ۲) بەنیازی بەخشش و خەڵات ف ۱) محتاج؛ ۲) چشم بەراه کمك دیگران.

**چاولەدەستی:** نیاز، ئاتاجی ف احتیاج.

**چاولەوەڕێن:** تۆڵاز، کەسێ کە زۆر چاو بۆژنان دەگێڕێ ف چشم‌چران.

**چاولێ‌بڕین:** ۱) بەتەمابون؛ ۲) لاساکردن ف ۱) اُمّیدوار [illegible]دن؛ ۲) تقلید.

**چاولێ بزکردنەوە:** ڕوانین بەهەڕەشەوە ف چشم غَرّە رفتن.

**چاولـێدان:** بەچــاوەوە کردن، چاوی پیس لێدان، پێ هەڵکــاڵان ف چشم‌زخم زدن.

**چاولێ قوُچـانـدن:** چاوپـۆشی کردن، بن لیچدان، خولێ دزینەوە ف چشم‌پوشی کردن.

**چاولێ کردن:** ۱) تواشا، لێ‌نوارین؛ ۲) لاسا، دمەلاسکەکردنەوە ف ۱) تماشاکردن؛ ۲) تقلید.

**چاولێك نان:** ۱) چاوقونجاندن، پیلوی چاو بەسەریەکا هێنان؛ ۲) برێتی لە مردن ف ۱) چشم برهم نهادن؛ ۲) کنایە از مرگ.

**چاولێکەری:** لاساکردنەوە، دەمەلاسکە ف تقلید.

**چاولێ نوُقان:** چاوپۆشی ف چشم‌پوشی.

**چاولێ نوُقاندن:** چاوپۆشی کردن ف چشم‌پوشی کردن.

**چاومار:** برێتی لە زۆر زرنگ و وریا ف کنایە از بسیار زیرك و باهوش.

**چاومەس:** کیژی چاوجوان ف دختری کە چشمان زیبا دارد.

**چاومەست:** چاومەس ف نگا: چاومەس.

**چاونۆڕ:** چەمەڕا، چاوەڕێ، چاڤنێر، چاوەڕوان ف مُنتَظر.

**چاونوُسان:** چاونوُقان ف چشم بستن.

**چاونوُقان:** چاوقوُچان ف چشم‌بستن.

**چاونەبار:** بەرچاوتەنگ، بەئێرەیی ف حسود.

**چاونەترس:** ئازا، بەجەرگ، بوێر ف دلیر و بی‌باك.

**چاونەترساو:** چاونەترس ف دلیر و بی‌باك.

**چاونەزێر:** ۱) بەئێرەیی، چاوچنۆك؛ ۲) ڕژد، دەس قوچاو، تەماح کار ف

١) حسود؛ ٢) خسيس.

**چاونه‌کراوه:** بێ‌ئه‌زمون، ناشاسا به‌کار، پیاوی هێشتاخاو [ف] ناآزموده و بی‌تجربه.

**چاونه‌یر:** چاوه‌نۆڕ [ف] چشم به‌راه.

**چاوه:** ١) ده‌سته‌چیله‌ی ئاگر؛ ٢) ژورێك له‌خانو؛ ٣) کانی ئاو؛ ۴) روبینی، ریا؛ ۵) کونی پلوره هه‌نگ [ف] ١) افروزه؛ ٢) اطاقی در خانه؛ ٣) چشمه؛ ۴) ریا؛ ۵) سوراخ کندوی عسل.

**چاوه‌پشیله:** چاوپشیله، گیایه‌که گوڵی له‌چاوی کتك ده‌کا [ف] گیاهی که به چشم گربه شبیه است.

**چاوبازه:** گیایه‌که [ف] گیاهی است.

**چاوه‌پۆڕ:** گیایه‌که [ف] گیاهی است.

**چاوه‌چاو:** روانین به‌دڵ نیگه‌رانی، تماشای هه‌مولاکردن، چاوگێرانی زۆر [ف] با نگرانی بهر سو نگریستن.

**چاوه‌چڵه:** چاوێنی، توشی به‌لا بون له‌چاوی پیسه‌وه [ف] چشم‌زخم دیدن.

**چاوه‌دوا:** چاوله‌دو، چه‌مه‌ورا، نیگه‌رانی بۆکه‌سێ [ف] دلواپس.

**چاوه‌دێر:** چاودێر [ف] ناظر.

**چاوه‌دێری:** چاودێری، ئاگالێ‌بون [ف] نظارت.

**چاوه‌ڕو:** شه‌رم، فهێت، فه‌دی، حه‌یا [ف] آزرم.

**چاوه‌روانی:** چاڤنێری [ف] انتظار.

**چاوه‌ڕێ:** چه‌مه‌ڕا، چاوه‌نۆڕ [ف] اُمّیدوار.

**چاوه‌ڕێگه:** چاوه‌ڕێ [ف] چشم‌به‌راه.

**چاوه‌زار:** ١) ده‌رد له‌چاوی پیسه‌وه؛ ٢) نوشته بۆ چاره‌ی ده‌رد له‌چاوی پیس [ف] ١) چشم‌زخم؛ ٢) چشمارو.

**چاوه‌سوُسکه:** چاوه‌سوێسکه [ف] نگا: چاوه‌سوێسکه.

**چاوه‌سوێسکه:** چاوه‌پۆڕ، گیایه‌که [ف] گیاهی است.

**چاوه‌ش:** ١) متریب، زورناژه‌ن؛ ٢) سه‌رده‌سته‌ی بیست‌که‌س له له‌شکرا [ف] ١) رامشگر؛ ٢) سردسته يك واحد بيست نفری در ارتش.

**چاوه‌قوُڵه:** نه‌خۆشی رشانه‌وه، تاعون [ف] طاعون.

**چاوه‌گا:** گیایه‌که گوڵێکی زه‌ردی ناوسپی ده‌کا [ف] گیاهی است.

**چاوه‌نداز:** دیمه‌ن، چاوگه، به‌رچاو [ف] چشم‌انداز.

**چاوه‌نوار:** چه‌مه‌ڕا، چاڤنێر [ف] چشم به‌راه.

**چاوه‌نواری:** چاڤنێری [ف] انتظار.

**چاوه‌نۆڕ:** چاڤنێر، چه‌مه‌ڕا [ف] چشم به‌راه.

**چاوه‌نۆڕی:** چاوه‌نواری [ف] انتظار.

**چاوهه‌ڵاتن:** ١) وریابون له کاروبار، فێربونی ئه‌رکی سه‌رشان؛ ٢) ره‌وادیتن: (**چاوم هه‌ڵنایه** له‌کاری وا ناهه‌ق) [ف] ١) آشناشُدن، راه افتادن؛ ٢) روادیدن.

**چاوهه‌ڵته‌کاندن:** هێما به‌چاو، عاشیره‌ت وه‌چه‌م، تێگه‌یاندن به بزاوتنی چاو [ف] ایما و اشاره با چشم و اَبرو.

**چاوهه‌ڵته‌کانن:** چاوهه‌ڵته‌کاندن [ف] نگا: چاوهه‌ڵته‌کاندن.

**چاویار:** چاوه‌دێر [ف] ناظر.

**چاویاری:** چاوه‌دێری [ف] نظارت.

**چاوێری:** چاوه‌دێری [ف] نظارت.

**چاویش:** ١) نازناوی پیاوی گه‌وره‌ی ئاینی یه‌زیدیه‌کان؛ ٢) سه‌رده‌سته‌ی عه‌سکه‌ری عوسمانی [ف] ١) لقب روحانی فرقهٔ يزيدی؛ ٢) سردسته در ارتش عُثمانی.

**چاوێشه:** چاوئێشه، کول‌بونی چاو، ده‌ردی چاو [ف] چشم‌درد.

**چاویلکه:** ١) گۆزلك، عه‌ینه‌ك؛ ٢) نه‌خۆشیه‌که به‌له‌کی نه‌خۆش پۆڕگ ده‌رده‌کا [ف] ١) عینك؛ ٢) نوعی بیماری، که در اثر آن ساق پای بیمار تاول می‌زند.

**چاویله:** چاویلکه [ف] نگا: چاویلکه.

**چاوێنی:** چاوه‌زار [ف] چشم‌زخم.

**چای:** ١) چا، تۆچا، ده‌رمان‌چا؛ ٢) فێنك، سارد [ف] ١) چای؛ ٢) خُنك، سرد.

**چایگ:** ساردو فێنْك، هوینْك [ف] خنك، سرد.

**چایمانی:** ١) سه‌رمابون، نه‌خۆشی له‌سه‌رماوه؛ ٢) ئاره‌قه‌ی ساردی له‌ش [ف] ١) سرماخوردگی؛ ٢) عرق سرد بدن.

**چایه‌ر:** له‌وه‌ڕگه [ف] مَرتَع.

**چایی:** چای، چا، تۆبه‌کی ره‌شه ده‌م ده‌کرێ‌و ده‌خورێته‌وه [ف] چای.

**چایین:** سه‌رمابون، هه‌ستی ساردی کردن [ف] سرماخوردن.

**چپ:** ١) ده‌نگی داکه‌وتنی دڵۆپه؛ ٢) سرته، چپه، قسه‌به ده‌نگی نزم [ف] ١) صدای چکه؛ ٢) پچ‌پچ کردن.

**چپاندن:** به‌سرته قسه‌کردن، سرکه‌کردن [ف] در گوشی گفتن.

**چپانن:** چپاندن [ف] دَر گوشی گُفتن.

**چپچپ:** ١) ده‌نگی له‌سه‌ریه‌کی داکه‌وتنی دڵۆپه؛ ٢) سرته، سرکه [ف] ١) صدای چکیدن مداوم آب؛ ٢) پچ‌پچ.

**چپك:** لکی تازه‌ده‌رهاتوی تاسك [ف] شاخهٔ نورسته.

**چپوهۆڕ:** سرته‌و خورته‌ی زۆر [ف] پچ‌پچ زیاد.

**چپه:** ١) سرته، سرکه؛ ٢) ده‌نگی دڵۆپه داکه‌وتن [ف] ١) پچ‌پچ؛ ٢) صدای چکیدن قطره.

**چپه‌چپ:** چپچپ [ف] نگا: چپچپ.

**چت:** ١) شت، تشت؛ ٢) تۆ کام‌شتت: (**چت** له‌من گه‌ره‌که) [ف] ١) چیز؛ ٢) تو کدام چیز را.

**چتر:** ڕێوی، رواس [ف] روباه.

**چتۆ:** چۆن؟ چلۆن؟ کو؟ [ف] چگونه.

**چتوُر:** چوێشتیر، تێشتیر، بزنی دوساڵه [ف] بُز دوساله.

**چتۆڤ:** چتۆ [ف] چگونه.

**چتیر:** چتوُر [ف] بز دوساله.

**چجار:** هیچگا، هه‌رگیز [ف] هیچگاه.

**چجای:** خۆ به‌تایبه‌تی، خۆنه‌خوازا [ف] چه جای آنکه.

**چچك:** ١) گوان، گوهانی مێوینه؛ ٢) گۆی سه‌رمه‌مك؛ ٣) میتکه [ف] ١) پستان؛ ٢) سرپستان؛ ٣) چچوله.

**چخ:** چغه، وشه‌ی ده‌رکردنی سه‌گ [ف] کلمهٔ راندنِ سگ.

**چخه:** چخ [ف] نگا: چخ.

**حەپیشاندن:** بەپەلە قوتدان ف با شتاب بلعیدن.

**حەپین:** ڕەوین، وەڕین، حەپـەحەپی سەگ: (شەوکە هات دەم دەکاتەوە وەك هار / وائەزانم سەگەو بەمن ئەحەپێ) «شێخ ڕەزا» ف پارس کردن سگ.

**حەتا:** تا، هەیا، هەتا ف حتی.

**حەتـار:** ۱) وردەواڵـە فرۆش؛ ۲) تێلاو کوتکی گێچ کوتـان؛ ۳) دەرمان فرۆش ف ۱) پیلەور؛ ۲) چوبی برای کوبیدن گچ؛ ۳) داروفروش.

**حەتحـەت:** بەروگیای بۆنخۆش کە وەك نوشتە بە منالیەوە دەدرون یان هەڵـداوەسن، وەك ئەسپـەندەر، مێخەك، شتی تریش ف گیاهی است معطّر مانند میخك.

**حەتحەتۆك:** حەتحەت ف نگا: حەتحەت.

**حەتر:** عەتر، تراوی بۆنخۆش ف عطر.

**حەترەك:** لێدان بەتوندی، قەوی لێخستن ف محکم زدن.

**حەح:** وشەی سەیرمان: (**حەح** چەند سەیرە!) ف کلمۀ تعجب.

**حەج:** زیارەتی مەکە، زیارەتی کابە ف حج.

**حەجاج:** حاجیان، ئەوانەی ویکڕا دەچنە زیارەتی کابە ف حجاج.

**حەجامات:** خوێن بەردان ف حجامت.

**حەجـامـات کێش:** وەستـای خوێن بـەردان، خوێن بەردەر ف حجامت‌چی.

**حەجامات گرتن:** خوێن بەردان ف حجامت کردن.

**حەججە:** وتەی لێخوڕینی بزنەگەل ف کلمەایست برای راندن گلۀ بز گویند.

**حەجکردن:** ۱) دیدار لەماڵی کابە، چونەمەکە؛ ۲) بردنەوەی دوامین کەلا لە گەمەدا ف ۱) حج رفتن؛ ۲) برنده شدن در تیله‌بازی.

**حەجـەم:** ۱) ئێرانی؛ ۲) ئەوی بەتـرکی ئازەربایجانی قسەدەکا ف ۱) ایرانی؛ ۲) متکلم به ترکی.

**حەجەمی:** ترکی ئازەربایجانی ف ترك آذربایجان.

**حەچ:** شەق، کاشۆ، گۆچانی گەمەی گۆیێن ف چوگان.

**حەچـان:** ۱) شەقێن، گۆیێن، گەمـەی گۆو گۆچـان، کاشـۆبازی؛ ۲) وەڕین، حەپین، ڕەوین ف ۱) چوگان‌بازی؛ ۲) پارس کردن.

**حەچـانـدن:** ۱) حەپـە پێ‌کردن، دنـەدانـی سەگ بۆ وەڕین؛ ۲) کەرلێخوڕین، ئاژۆتنی کەر ف ۱) پارس دادن سگ؛ ۲) راندن خر.

**حەچچە:** وشەی لێخوڕینی گوێرێژ، هەچە، حەچە ف واژۀ راندن ستور.

**حەچکۆ:** هەرچۆنێك، هەرجۆر ف هرطور.

**حەچە:** ۱) حەچچە؛ ۲) نێری؛ ۳) وەڕەوەڕی تێکەڵ پێکەڵی سەگ ف ۱) نگا: حەچچە؛ ۲) بز نر؛ ۳) عوعو سگ.

**حەچەحەچ:** حەپە حەپی زۆرو بێ‌بڕانەوە ف پارس کردن بدون انقطاع.

**حەچەل:** شڵتاغ، گەڕ، دەبە، بیانو پێ گرتن، تەشقەڵە ف شلتاق.

**حەچولۆڕ:** حەپین ولۆڕەی تێکەڵ ف عوعو و زوزه کشیدن همراه هم.

**حەچی کە:** حەچکۆ ف هرطور.

**حەد:** ۱) ڕادە، ئەندازە؛ ۲) شیان، ڕاکەوتن: (**حەدی** چیە باسم بکا!)؛ ۳) سنور، کەوشەن ف ۱) اندازە؛ ۲) قدر و منزلت؛ ۳) مرز.

**حەدەف:** تەپۆڵکە، گر، گردولکە ف تپە.

**حەدیس:** فەرمایشی پێغەمبەر ف حدیث.

**حەراج:** مەزات، هەڕڕاج ف حراج.

**حەرارەت:** گەرمای تاو نۆبەتێ ف تب.

**حەرام:** ناڕەوا ف حرام.

**حەرام‌خۆر:** کەسێ بەشی ڕەوای خەڵکی تر دەخوا ف حرام‌خور.

**حەرامزادە:** ۱) زۆڵ، بیژو، بیچ؛ ۲) برێتی لە پیاوی فیڵبازو بەدفەڕ ف ۱) فرزند نامشروع؛ ۲) کنایه از حیله‌گر و مردم‌آزار.

**حەربلین:** ۱) گرێ تێکەوتنی گوریس؛ ۲) ئاڵۆزانی بەن و پەتك ف ۱) گره‌خوردن ریسمان؛ ۲) پاره‌شدن طناب.

**حەرسیل:** بەردی بناغەی گۆشەی دیوار ف سنگ بنای گوشه دیوار.

**حەرسیلە:** حەرسیل ف نگا: حەرسیل.

**حەڕش:** تەختی خودا ف عرش.

**حەرشی حەزیم:** حەڕش ف عرش.

**حەڕگ:** قوڕ، خۆڵ و ئاوی تێکەڵاو، حەڕی ف گل.

**حەڕماندن:** ۱) بێ‌بەش کردن؛ ۲) بەخەساردان ف ۱) محروم کردن؛ ۲) به هدردادن.

**حەڕمین:** ۱) بێ‌بەش بون؛ ۲) بەخـەسـارچـون، بەفیرۆچـون ف ۱) محروم شدن؛ ۲) به هدر رفتن.

**حەرەکەت:** بزوتن، جوڵان، جوڵە ف حرکت.

**حەرەم:** بریناوی ژن، ژن‌بۆمێرد: (بێزارە لەتۆ، ئێستە هەماغۆشی عەدوتە / دنیا کە لەلای خۆت **حەرەمی** موحتەڕەمت بو) «نالی» ف همسر.

**حەرەمسەرا:** هندرو، ئەندەرون، خانوی جێگەی ژنانی ماڵ ف اندرونی.

**حەڕی:** حەڕگ، قوڕ ف گل.

**حەریر:** ۱) پارچەی ئاوریشم، قوماشی لە هەورێشم؛ ۲) هەڵوای دۆشاو ف ۱) حریر؛ ۲) حلوا.

**حەریف:** ۱) هاوتا؛ ۲) هاوقومار؛ ۳) دۆستی ژنی بەمێرد ف ۱) همتا؛ ۲) طرف مقابل در قمار؛ ۳) معشوق.

**حەز:** ۱) ئارەزو؛ ۲) ئیشتیا، واز؛ ۳) لەپـاش وشـەواتـا: خۆشـەویست: (پیرۆت وەتـەن **حەزە**)؛ ۴) پەسنـدو بەردڵ؛ ۵) دڵـداری، ئەوین؛ ۶) دۆست؛ ۷) جوان، بەدەو: (کچێکی **ناحەزە**) ف ۱) آرزو؛ ۲) اشتها؛ ۳) پسوند بەمعنی دوستدار؛ ۴) پسندیده؛ ۵) عشق؛ ۶) دوست؛ ۷) زیبا.

**حەزاب:** ئازار ف عذاب.

**حەزکردن:** خواستن، بەتەمابون ف خواستن.

**حەزلێکـردن:** ۱) ئارەزوکـردن؛ ۲) عاشق‌بون ف ۱) آرزو کردن؛ ۲) عاشق شدن.

**حەزلێکردویی:** دڵداری نێوان دوکەس ف عاشقی.

**حەزلێکەری:** دڵداری ف عاشقی.

**حەزوناحەز:** دۆست و دوژمن ف دوست و دشمن.

**حەزیا:** هەژدیها، زەها، حەفی ف اژدها.

**حەزیران:** حوزەیران ف نگا: حوزەیران.

**حەزیرانی:** جۆرێك هەرمێ، تەحرێ هەمروٚ ف نوعی گلابی.

**حەژ:** حەز ف نگا: حەز.

**حەژدە:** هەژدە ف هیجدە.

**حەژدەهی:** دیدەنی کردنی بەکۆمەڵ ف دید و بازدید خانوادگی.

**حەژمەت:** مەینەت، خەفەت، کەسەر، خەم، کول ف اندوە.

**حەژیکرن:** حەزلێکردن ف نگا: حەزلێکردن.

**حەس:** ١) هەست، ئاگاکـردن، های؛ ٢) وشـەی سەیرمان ف ١) آگاه کردن؛ ٢) کلمهٔ تعجب.

**حەساب:** ژمارە، حیساب، حەساو، لێکدانەوە ف حساب.

**حەسار:** حەوش، گۆڕایی ناوچوار دیواری ماڵ ف حیاط.

**حەساس:** جەزایرچی، پاسەوانی شەو ف عسس، شبگرد.

**حەساندنەوە:** بێ خەم کردن، ئاسودە کردن ف راحت کردن.

**حەسانن:** حەساندنەوە ف راحت کردن.

**حەسانەوە:** ١) لەماندوەتی رزگار بون؛ ٢) خاتر جەم بون ف ١) خستگی درکردن؛ ٢) خاطرجمعی.

**حەساو:** ١) حیساب، لێکدانەوە؛ ٢) وچان گرتو ف ١) حساب؛ ٢) آسودە.

**حەساوگەر:** حیساب گەر، فاڵ گرەوە بە تەزبیح ف فالگیر.

**حەساوە:** ئاسودە، دور لەماندویی ف آسودە.

**حەساوی:** جسنەکەری سپیو هەرەچاك ف خر سفید و چالاك.

**حەسپ:** ئەسپ، هەسپ ف اسب.

**حەسپن:** شێتی دڵداری ف مجنون دلدادگی.

**حەستەم:** زۆر دژوار، سەخت ف دشوار، سخت.

**حەسحەس:** حەساس، جەزایرچی ف عسس، شبگرد.

**حەسیان:** ١) خەوەرداربون، ئاگاداربون؛ ٢) حەسانەوە ف ١) خبردار شدن، آگاه شدن؛ ٢) نگا: حەسانەوە.

**حەسیانەوە:** حەسانەوە ف نگا: حەسانەوە.

حەسیر: رایەخی لە جەگەنو قامیش ف حصیر.

**حەسیرچن:** وەستای حەسیر دروست کردن ف حصیر باف.

**حەسیرمەیدان:** برێتی لە دارکاری ف کنایە از کتك کاری.

**حەسیرۆ:** برێتی لە: ١) خەسو؛ ٢) خەزور ف کنایە از: ١) مادرزن؛ ٢) پدرزن.

**حەسین:** پێ زانین، ئاگاداربون، هەست پێ کردن ف خبردار شدن، آگاه شدن.

**حەسینەوە:** حەسانەوە ف نگا: حەسانەوە.

**حەش:** ورچ، هرچ ف خرس.

**حەشار:** ١) بۆسـە، جێگـەی خۆتێدا شاردنـەوە؛ ٢) وەشـارتن ف ١) مخفیگاە؛ ٢) پنهان کردن.

**حەشاردان:** وەشارتن، شاردنەوە، ڤەشارتن ف پنهان کردن.

**حەشاردراو:** شێراوە، ڤەشارتی ف پنهان شدە.

**حەشارگە:** جێگەی شاردنەوە، بۆسە، رەبەت ف مخفیگاە.

**حەشامات:** ئاپۆرەی خەڵك، کۆمەڵی زۆر لە مەردم ف گروە مردم.

**حەشت:** هەشت، یەكو حەوت ف هشت.

**حەشتێ:** هەشتا، هەشت جارانده ف هشتاد.

**حەشـر:** ١) ڕۆژی قیامـەت، سەڵا، ڕۆژی پسـات؛ ٢) برێتی لە هەراو هوریای تێکەڵو پێکەڵ ف ١) روز قیامت؛ ٢) کنایە از شلوغی.

**حەشروحەلا:** هەراوزەنا، چەقەوگوڕە ف شلوغی.

**حەشرەلا:** حەشر وحەلا ف شلوغی.

**حەشفاندن:** دەراویتن، لەریزوەدەرنان ف حذف کردن.

**حەشکاندن:** رێك گوشین، وشین ف فشردن.

**حەشکوڵە:** بەچکەحرچ، بیچووەورچ، بیوەڵەورچ ف بچە خرس.

**حەشمەت:** ١) تەریقی، شەرمەزاری؛ ٢) پەژیوانی ف ١) شرمندگی؛ ٢) پشیمانی.

**حەشەرەلا:** حەشر وحەلا ف شلوغی.

**حەشەری:** ژنێ کە زۆر تینوی گانە ف حَشری، حگَە.

**حەشەنورە:** گیایەکە لەتوتن دەکاو جاری واهەیە وەك توتن دەکێشرێ ف گیاهی است شبیە توتون.

**حەشیشە:** بەنگ، حەشیش، چەرس ف حشیش.

**حەشیمەت:** حەشامات، ئاپۆرە ف تودهٔ مردم.

**حەف:** ١) بوگەن؛ ٢) گەنیو؛ ٣) حەپ ف ١) بدبو؛ ٢) گندیدە؛ ٣) پارس سگ.

**حەفار:** حەف ف نگا: حەف.

**حەفت:** یەكو شەش، حەوت، هەفت ف هفت.

**حەفتا:** شێستو دە، حەوجاردە، حەوتا ف هفتاد.

**حەفتار:** کەمتیار ف کفتار.

**حەفتامین:** جاری حەفتایەم ف هفتادمین.

**حەفتانە:** ١) موچەی بەحەوروژ جارێك؛ ٢) ڕۆژنامەی بەحەوروژجارێك ف ١) مزد هفتگی؛ ٢) نشریهٔ هفتگی.

**حەفتاو:** گڵاو، شوشتنی جێ دەمی سەگ بەجارێك قوڕاوو شەش جار ئاو ف شستشوی مکرر بدن یا لباس با آب و گِل برای رفع نجاست سگ.

**حەفتاهەم:** حەفتامین ف هفتادمی.

**حەفتایەم:** حەفتامین ف هفتادمین.

**حەفتبرا:** حەوبرالە، حەوت ئەستێرەن وەك پیتی «ك» ف صورت فلکی هفت برادران.

**حەفت جۆش:** لولێنەی لە مەفرەق ف آفتابە مفرغی.

**حەف حەفی:** زۆرخۆری بەلەز خۆر ف شکم‌پرست.

**حەفت روح:** برێتی لە زیندەوەرێ کە درەنگ گیان بە دەستەوە دەدا ف کنایە از زندەای کە دیر بمیرد، هفت جان.

**حەفت رەنـگ:** ١) دوڕو، روبین؛ ٢) جۆرێ مەخمەری ڕێ‌ڕێ ف ١) منافق؛ ٢) نوعی مخمل.

**حەفت ڕەنگیلە:** ڕەنگـریژە، باڵداریکە بەچەند ڕەنگ، حەورەنگیلە ف پرندەای الوان.

**حەفت رەنگـە:** حەوتـرینگە، فیلو فیلەتەن، چێشتێکە لەنیسكو نۆكو گەنمو کشمیشو قەیسیو سماق لێ دەندرێ [ف] نوعی غذا.

**حەفت مێردە:** حەوکەس کە لە غارێکدا قەتیس ماونو دەڵێن ئێستاش ماون [ف] اصحاب کهف.

**حەفتۆخ:** کوانێکی رەقە درەنگ چاك دەبێتەوە [ف] دملی کە دیر خوب شود.

**حەفتوك:** حەفتۆخ [ف] نگا: حەفتۆخ.

**حەفتە:** حەوتە، هەفتە، لەشەممەوە تاهەینی [ف] هفتە.

**حەفتەبیجاڕ:** حەفت رەنگە، حەوترینگە [ف] هفت بیجار.

**حەفتـەکۆك:** جۆرێ سەعات کە حەوتەی جارێك قورمش دەکرێ [ف] نوعی ساعت کە هفتەای یکبار کوك می‌شود.

**حەفتـەکێش:** کێشـانی ماین لە ئەسپ لە حەوتـەی زانی‌دا [ف] کشش مادیان از اسب در هفتە زادن.

**حەفتەوانان:** حەوتەوانە، حەوت‌برالە [ف] صورت فلکی هفت برادران.

**حەفتەوانە:** حەفتەوانان [ف] نگا: حەفتەوانان.

**حەفتێ:** ۱) حەفتا؛ ۲) حەفتە [ف] ۱) هفتاد؛ ۲) هفتە.

**حەفجۆش:** حەفت‌جۆش [ف] نگا: حەفت جۆش.

**حەفس:** حەپس [ف] نگا: حەپس.

**حەفسی:** حەپسی [ف] زندانی.

**حەفك:** ئەوك، قورگ، گەرو [ف] گلو.

**حەفی:** ۱) هەژدیها، حەزیا، زەها؛ ۲) ماری‌زل [ف] ۱) اژدها؛ ۲) افعی.

**حەفیان:** ۱) زۆرخۆر؛ ۲) وەڕین [ف] ۱) پرخور؛ ۲) پارس کردن.

**حەفین:** وەڕین، حەپین [ف] پارس کردن.

**حەڤدە:** دەو حەوت [ف] هفدە.

**حەڤدەم:** دوای شانزدەیەم [ف] هفدهم.

**حەڤدەمین:** حەڤدەم [ف] هفدهمین.

**حەڤدەهەم:** حەڤدەم [ف] هفدهم.

**حەڤدەهەمین:** حەڤدەمین [ف] هفدهمین.

**حەق:** ۱) لەمەڕ، بارە: (دەر **حەق** من باش نەبو)؛ ۲) خودا؛ ۳) کرێ، مزە، مز؛ ۴) نرخ، قیمەت؛ ۵) راستی؛ ۶) پەیوندی: (**حەقێکم** پێوەنیە)؛ ۷) هەڕەت، جەنگە: (**حەقە** پەڵەیە)؛ ۸) تۆڵە [ف] ۱) دربارە؛ ۲) خدا؛ ۳) مزد؛ ۴) قیمت، نرخ؛ ۵) راستی؛ ۶) دَین؛ ۷) عنفوان؛ ۸) انتقام.

**حەقانی:** مرۆی راستو دوروست [ف] درستکار.

**حەقایەت:** حیکایەت، چیرۆك، سەربهورد [ف] داستان.

**حەق‌حەق کەرە:** تاق‌تاق کەرە، توتاك، مەلێکە شەو ناخەوێو هەردەڵێ تاك، قڕاوکە [ف] مرغ حق.

**حەق ساندنەوە:** تۆڵە ساندن، حەیف هەلانین [ف] انتقام گرفتن.

**حەق کردنەوە:** قەرەبودان [ف] تلافی کردن.

**حەقلی مەقۆ:** ۱) گەمەی پشکیلان؛ ۲) هەراوزەنا؛ ۳) حندرحۆ [ف] ۱) بازی پشك انداختن؛ ۲) جار و جنجال؛ ۳) الاکلنگ.

**حەقلی مەمان:** جۆرێ گاڵتە [ف] نوعی بازی.

**حەقلی مـەمۆ:** حـەقلی مەمـان [ف] نگا: حەقلی مەمان.

**حەقەپەڵە:** هەڕەتی بارانی پاییز [ف] عنفوان بارش پائیزی.

**حەقەوەسێـن:** ۱) تۆڵە کەرەوە؛ ۲) قەرەبو [ف] ۱) انتقام گیـرندە؛ ۲) تلافی.

**حەك:** ۱) وشـەی ئاوات؛ ۲) وشەی دنەدان، دەك؛ ۳) هەڵپر یواندن؛ ۴) وشەی سەیرمان [ف] ۱) حرف تمنا؛ ۲) حرف تشجیع؛ ۳) حك کردن؛ ۴) حرف تعجب.

**حەکاك:** مۆرهەڵقەن [ف] مهرساز.

**حەکایەت:** چیرۆك [ف] داستان.

**حەکە:** ئاڵۆش، خوروی لەش [ف] خارش پوست.

**حەکەدار:** حەشەری، ژنی تنوی گان [ف] حکّە، حشری.

**حەکیم:** بژیشك [ف] پزشك.

**حەگال:** پەتی سەری عارەبان [ف] عقال.

**حەل:** ۱) دروست، راست: (ئـەم قسـەت **حەل** نەبو)؛ ۲) توانەوە: (ئەم شەکرە لەچادا **حەل** نابێ)؛ ۳) شیاو: (تۆ**حەل** نی لەم گەمەیەدا)؛ ۴) وەخت، کات: (ئـەو **حەلـە** نەهـاتی) [ف] ۱) راست، درست؛ ۲) حل شدن؛ ۳) شایان؛ ۴) وقت، هنگام.

**حەلاج:** هەلاج، کوڵکەو پەمۆ شی‌کەرەوە بەکوتكو کەوان [ف] حلاج، پنبەزن.

**حەلاڵ:** رەوا [ف] حلال.

**حەلامەت:** زۆرسەیر، عەجایب [ف] عجیب.

**حەلان:** تاوێر، جاڵە [ف] سنگ غلتان از کوە.

**حەلاندن:** تاواندنەوە، تواندنەوە [ف] ذوب کردن.

**حەلانە:** تۆڵا خورمای دەپۆشەوە پێچراو [ف] خرمای بستەبندی شدە.

**حەلاو:** ناوە بۆ ژنان [ف] از نامهای زنان.

**حەل بون:** توانەوە، تاوانەوە [ف] حل شدن.

**حەلحەلە:** تەشقی عاسمان [ف] اوج آسمان.

**حەلقە:** ئاڵقە، گەو [ف] حلقە.

**حەلقەدان:** ۱) بەدەورەی یەکترەوە دانیشتن؛ ۲) دەورەلە شتێك دان [ف] ۱) بە دور هم نشستن؛ ۲) محاصرە کردن چیزی.

**حەلك:** ۱) قسەی خۆش؛ ۲) قسەخۆش [ف] ۱) بذلە؛ ۲) بذلەگو.

**حەلکی:** هێژا، بەنرخ [ف] ارزشمند.

**حەڵلادۆشکە:** حیندرحۆ [ف] الاکلنگ.

**حەڵلادۆشە:** حەڵلادۆشکە [ف] الاکلنگ.

**حەڵلاقوچکە:** ۱) حندرحۆ، سیسۆ؛ ۲) بەسەریەکا دراوی قوچەوەبوگ [ف] ۱) الاکلنگ؛ ۲) انباشتەشدە.

**حەللەق:** دەگەڵ وشەی مەللەق دەوترێ واتا: قسەی بی‌سەروپا [ف] همراە با «مەللەق» بەمعنی حرف بی‌ربط.

**حەللەق مەللەق:** قسەی سوكو چروك [ف] حرف بی‌معنی و مفت.

**حەللەلا:** زۆرسەیرە، پەکو [ف] واژە تعجب.

**حەلو:** هەڵوژە، هەڵوچە [ف] آلوچە.

**حەلوا:** ۱) هەڵوا، شیوی دۆشاو و ئاردو رۆن؛ ۲) گەڕگەری [ف] ۱) حلوا؛ ۲) نگا: گەڕگەری.

**حەلواچی:** هەڵوافرۆش [ف] حلوافروش.
**حەلوای بەشەقان:** جۆرێ گەمەیە [ف] نوعی بازی.
**حەلوایی:** بەڕەنگی هەڵوا، سوُری تۆخ [ف] بەرنگ حلوا.
**حەلـۆ:** لەپێش وەشـەی جەلـۆدا دێت، واتـا: رەجـاڵەو بۆرەپیاگ [ف] با «جەلۆ» آید بەمعنی آدم عامی.
**حەلوچك:** هەڵوچە، حولوك [ف] آلوچە.
**حەلوكە:** هەڵوچە [ف] آلوچە.
**حەلوەلا:** پەلەپەل و تەنگانە [ف] عجلە.
**حەلەب:** ۱) دروس، قبوڵ لەناودا: (لەگاڵتەدا منیش **حەلەبم**)؛ ۲) رەوا: (ئەم كارەت **حەلەب** نەبو) [ف] ۱) قبول شدە؛ ۲) جایز.
**حەڵـەب:** ۱) شارێکـە لە سوریەی ئێستاو قەدیم هەموی كوردبوە؛ ۲) ناوی ژنانەیە [ف] ۱) از شهرهای سوریە؛ ۲) از نامهای زنان.
**حەڵـەبی:** ۱) خەڵکی شاری حەڵـەب؛ ۲) تەنـەكـەی دەفـری رۆن و شتی تراو [ف] ۱) اهالی شهر حَلَب؛ ۲) فلز حلبی.
**حەلـەق مەلـەق:** ۱) حینـدرحۆ، حێجلقانە، هیلاهۆپ، حندرحۆ؛ ۲) حەللەق مەللەق [ف] ۱) الاکلنگ؛ ۲) حرف مُفت.
**حەلەلا:** چەقەو هەراو تێكەڵ پێكەڵی: (عەجەب حەشر و **حەلەلا**یەكە) [ف] جنجال.
**حەلەلە:** دنەدانی سەگ بۆ تێ بەربون [ف] تشجیع سگ برای حملە.
**حەلەم:** ۱) ئازار، دەرد؛ ۲) عەیب، زەدە [ف] ۱) درد و رنج؛ ۲) عیب و زدگی.
**حەلی:** نەخوێندەوار بەعەلی دەڵێ [ف] علی بەزبان عامیانە.
**حەلێ:** فەرمان بە هەڵاتن، ڕاكە [ف] امر بە دویدن.
**حەلیان:** حەلان [ف] نگا: حەلان.
**حەلێب:** حەلەب، حەل [ف] نگا: حەلەب، حەل.
**حەلێ حەلێ:** گەمەیەكی تازە لاوانە [ف] نوعی بازی.
**حەلیم:** ۱) بەحـەوسـەلـە، لەسەرخۆ، هێمن؛ ۲) چێشتی كەشكەك؛ ۳) ناوەبۆ ژنان؛ ۴) فەریكەكەشك [ف] ۱) بردبار؛ ۲) خوراك حلیم؛ ۳) از نامهای زنان؛ ۴) نوعی كشك.
**حەلیمـاو:** هەلیماو، برنج لەئاودا كوڵاو، شۆربای برنج بێ‌رۆن [ف] آش برنج بدون روغن.
**حەلین:** توانەوە، تاوانەوە [ف] حل كردن.
**حەلێو:** حەلێب [ف] نگا: حەلێب.
**حەم:** خواردن لە زمانی منالاندا: (ئەوە فەی تۆیە **حەمی**كە) [ف] خوردن در زبان كودكان.
**حەمـاڵ:** ۱) مرۆی بار هەڵگـر، عەنباڵ، حەمباڵ؛ ۲) كاریتە؛ ۳) داری لای دیوار بۆ بن كاریتە [ف] ۱) حمال؛ ۲) بالار؛ ۳) ستون.
**حەمام:** گەرماو، گەرماوە، حومام [ف] حمام.
**حەمامچی:** كەسێ بەسەر حەمام رادەگا [ف] حمامی.
**حەمـامكردن:** ۱) چونە حەمام؛ ۲) خۆششتن لەئاو، بەئاو [ف] ۱) حمام گرفتن؛ ۲) شستشوی بدن.
**حەمـامۆك:** ۱) گەمە بەخۆڵ و خاك كردنی منداڵان كە خۆڵ وەك گومبەز لێدەكەن؛ ۲) ناوی كانی و ئاوێكی بەناوبانگە لەشاری «كۆ»یە [ف] ۱) نوعی بازی بچّەها با خاك؛ ۲) نام یك چشمە مشهور.
**حەمامۆكە:** گەمە بەخۆڵ [ف] بازی با خاك.
**حەمامۆكێ:** حەمامۆكە [ف] بازی با خاك.
**حەمایەت:** كەوی، كەدی، رام [ف] رام، اهلی.
**حەمایەڵ:** هەرچی راست و چەپ دەمل كرێ و شۆربێتەوە: (**حەمایەڵی** شیر، **حەمایەڵی** دوعا) [ف] حمایل.
**حەمبـار:** ژوری كەل و پەلی خواردەمـەنی و شت تێدا هەڵگرتن، عەمار، عەنبار [ف] انبار.
**حەمبارەپۆ:** كوتاڵی رزیو لە حەمباردا [ف] كالای داغی در انبار.
**حەمبەڵی:** كەسێ كە هەرچی دەكالای وایە خاوێن نەبۆتەوە، وەسواس [ف] وسواس.
**حەمتر:** كەری چكۆڵەی بەكار [ف] خر كوچك كاری.
**حەمتەر:** مەیمونی لۆتی، فلفل، قونسور [ف] عنتر.
**حەمحەم:** ۱) وشەی دنەدانی منداڵ بۆخواردن؛ ۲) جوجە، جانەوەرێكی سوری بچوكە بەپیاو هەڵگەرێ لیر دەكا [ف] ۱) واژەای برای تشویق كودك بە خوردن؛ ۲) ساس.
**حەمد:** ئاگایی، قەست: (بێ حەمدێ خۆ ئەڤ شول كر) [ف] قصد.
**حەمدەن:** بەقەستی، لەقەستی [ف] عمداً.
**حەمزك:** جۆرێ چێشتە [ف] نوعی غذا.
**حەمـزەل:** بازیەكـە، دەستـەیەك دادێنەوەو دەستەیەك بەسەر پشتیاندا بازدەدەن [ف] نوعی بازی.
**حەمشین:** هەڵوژە قەیسی، بەری دارێكە لە هەڵوچەو قەیسی پەیوەندە [ف] شلیل.
**حەمكە:** ئەندازەیەكی زۆر [ف] اندازەای بسیار.
**حەمل:** ۱) زك‌پڕی؛ ۲) گاڵتەو گەپ [ف] ۱) بارداری؛ ۲) شوخی و مزاح.
**حەملە:** پەلامار، شاڵاو [ف] حملە.
**حەمو:** گش، گشت، هەمو، سەرپاك [ف] همە.
**حەمەدەشین:** حەمشین [ف] شلیل.
**حەمەڕەمزێ:** مل ملانێ، ڕك بەركێ، رق‌بەرقە، بەربەرەكانی [ف] رقابت.
**حەمیسەن:** جۆرێ بزنە [ف] نوعی بز.
**حەمی:** هەمو، گش [ف] همە.
**حەن:** حاند [ف] جای مشخص.
**حەنا:** حەن [ف] نگا: حەن.
**حەنبـاڵ:** ۱) عەمبـاڵ، كۆڵەكەی بەركاریتە؛ ۲) مرۆی بارهەڵگر [ف] ۱) ستون خانە؛ ۲) حمّال.
**حەنبەڵ:** حەمایەڵ [ف] حمایل.
**حەنبەڵی:** ۱) كەسێ كە لەشت شوشتن دا زۆر دودڵە؛ ۲) پەیرەوی ئیمام ئەحمەدی حەنبەل [ف] ۱) وسواس؛ ۲) حنبلی.
**حەنتیكە:** ۱) زۆر بەقیمەت؛ ۲) زۆرسەیر؛ ۳) شتی زۆر لەمێژینە [ف] ۱) بسیار باارزش؛ ۲) عجیب؛ ۳) عتیقە.
**حەنتیكەخانە:** جێگای رانانی شتی زۆر بەنرخ و كەونارا [ف] موزه.

**حەنجەت:** بەهانە، پەڵپ ف بهانه.
**حەنجەل:** وەختی مردن ف اَجَل.
**حەندرحۆ:** حندرحۆ ف الاکلنگ.
**حەندوله:** ئۆمەگەنمێکی درشت ف نوعی گندم.
**حەندۆلی:** دۆدانە، شیرمەشك ف مشك كوچك.
**حەندەف:** حەدەف، تەپۆڵکە، گردولکە ف تپه.
**حەرزەگۆ:** گیایەکە ف گیاهی است.
**حەنزەل:** حەمزەل ف نگا: حەمزەل.
**حەنگرین:** بە رق داچون، دە رکەوە چون ف لج کردن.
**حەنەزا:** هەنەزاگ، زرکورێ کە دەگەڵ ژن هاتوە ف پسرخوانده.
**حەنەفی:** ۱) پەیڕەوی مەزەبی ئیمام ئەبو حەنیفە؛ ۲) شێرەی ئاو ف ۱) حنفی؛ ۲) شیر آب.
**حەنەك:** جەفەنگ، قسەی گاڵتەو گەپ ف بذله.
**حەنەکچی:** گاڵتەچی، قسەسەیر، قسەخۆش ف بذله‌گو.
**حەو:** ۱) حەوت؛ ۲) وشەی سەیرمان؛ ۳) بانکردنی پەز؛ ۴) وەڕەی سەگ ف ۱) هفت؛ ۲) کلمهٔ تعجب؛ ۳) صدا زدن بز؛ ۴) پارس سگ.
**حەوا:** ۱) بڵنـدایی دەوری زەمین؛ ۲) عاسمان؛ ۳) بڵندایی ف ۱) جوّ زمین؛ ۲) آسمان؛ ۳) ارتفاع.
**حەوادان:** فڕێدان بەرەو ژور ف پرتاب کردن بەطرف بالا.
**حەوار:** هاوار، گازی ف فریاد.
**حەواری:** حەوار ف فریاد.
**حەواق:** بڵندی بەرەو عاسمان ف بلندی.
**حەواڵـە:** ۱) بەنـوسراوە پارەوەرگرتن؛ ۲) ناردن: (بۆم **حەواڵە**کە)؛ ۳) سپاردن: (**حەواڵەی** قیامەت بی) ف ۱) حواله؛ ۲) حواله‌کردن؛ ۳) سپردن.
**حەواڵەبەگەواڵە:** دەستی دەستی، ئەمڕۆ بەسبە، تەفرەدان ف امروز و فردا کردن.
**حەوان:** حاوانەوە ف نگا: حاوانەوە.
**حەوانچە:** فڕێدراو، هاوێژراو ف پرت شده.
**حەوانچەدان:** بەرەو ژورهاویشتن ف بەطرف بالا پرتاب کردن.
**حەواندنەوە:** حاواندنەوە ف نگا: حاواندنەوە.
**حەوانن:** ئاگاداری کردنو لای خۆ راگرتن ف مراقبت کردن.
**حەواننەوە:** حەواندنەوە ف نگا: حەواندنەوە.
**حەوانـەوە:** ۱) ئاسـودەژیان؛ ۲) جێبونـەوە لە شوێنێك ف ۱) راحت زیستن؛ ۲) جای گرفتن.
**حەواوی:** چاو لەحەوا، کەسێ رەشکێنەی چاوی بەرەژور دەڕوانێ ف کلاپیسه.
**حەواویلکە:** ۱) هەڵدراو بەرەو حەوا؛ ۲) تەیارەی کاغەز، بادەوە ف ۱) بەهوا کردن؛ ۲) هواپیمای کاغذی.
**حەوایی:** حەواوی ف نگا: حەواوی.
**حەوبرا:** حەوبرالە، حەوتەوانە ف نگا: حەفتەوانە.
**حەوبرالە:** حەوبرا، حەوت ئەستێرەن لە نزیك یەك ف نگا: حەفتەوانە.

**حەوت:** حەفت، حەو ف هفت.
**حەوتا:** حەفتا ف هفتاد.
**حەوتانە:** ۱) مزی حەوتە بەحەوتە؛ ۲) رۆژنامەی لەحەوتەدا جارێك ف ۱) مزد هفتگی؛ ۲) نشریه هفتگی.
**حەوتبەند:** جۆرێ شیعر ف نوعی ترجیع‌بند.
**حەوت خشتەکی:** پارچە هەڵبەستی حەولەت ف شعری که هر قسمت آن هفت مصرع باشد.
**حەوت گوڵ:** جۆرێ گەنم ف نوعی گندم.
**حەوتم:** شیوبەخشین بەهۆی حەوتەی منالبونو حەوتەی مردو ف صدقه.
**حەوتو:** ۱) حەفتە؛ ۲) حەورۆژەی منالبون ف ۱) هفته؛ ۲) هفتهٔ زایمان.
**حەوتە:** ۱) حەفتە؛ ۲) حەپەی سەگ ف ۱) هفته؛ ۲) پارس سگ.
**حەوتەکێش:** حەفتەکێش ف نگا: حەفتەکێش.
**حەوتەم:** دوای شەشەم ف هفتم.
**حەوتەمین:** حەوتەم ف هفتمین.
**حەوتەوانە:** حەوبرالە ف نگا: حەوبرالە.
**حەوتیر:** جۆرێ دەمانچە کەحەوفیشەك دەخوا ف هفت‌تیر.
**حەوج:** نیاز ف نیاز.
**حەوجۆش:** حەفتجۆش، لولینەی مەفرەق ف آفتابه مفرغی.
**حەوجە:** حەوج ف نیاز.
**حەوحەو:** ۱) حەپەحەپی سەگ؛ ۲) وشەی سەیرمان؛ ۳) هەراو هوریای سواران ف ۱) پارس سگ؛ ۲) کلمهٔ تعجب؛ ۳) هیاهوی سوارکاران.
**حەودەل:** پەڵوڵە ف نگا: پەڵوڵە.
**حەورەنگیلە:** رەنگرێژە، حەفت رەنگیلە، مێش خۆرە ف زنبورخوار.
**حەوز:** برك، جێئاو ف حوض.
**حەوزانە:** پیتاکی میراو ف مزد میراب.
**حەوسەلە:** سەبرو پشو لەسەر خۆیی ف حوصله.
**حەوش:** ۱) حەسار؛ ۲) دەورو بەری ماڵ: (لەو حەولو **حەوشانە** بو)؛ ۳) ماڵ ف ۱) حیاط؛ ۲) اطراف خانه؛ ۳) خانه.
**حەوشە:** ۱) حەسار؛ ۲) جێ شەوێنی ئاژەڵ؛ ۳) ماڵ ف ۱) حیاط؛ ۲) حیاط مانندی برای نگهداری دام؛ ۳) خانه.
**حەوق:** ۱) پلەی نەردیوان، پلەپەیژە؛ ۲) گیروگرفتی بی‌دەرەتان ف ۱) پلّه نردبام؛ ۲) گرفتاری.
**حەوق بون:** حاوقان ف گرفتار شدن.
**حەول:** تەقالا، کۆششت ف کوشش.
**حەول و حەوش:** دەوروبەر ف اطراف.
**حەووا:** خێزانی بابەدەم، دایکەوا ف حوا، همسر آدم.
**حەویان:** ۱) ئاژەڵ، حەیوان؛ ۲) حاوانەوە ف ۱) حیوان؛ ۲) آسوده زیستن.
**حەوێق:** هەرەبەرز، بەرزایی عاسمان ف بلندی آسمان.
**حەوێنج:** تۆوێکی وردەبەنانیەوە دەکەن ف خشخاش نان.
**حەوێنجی:** بریتی لەگون ف کنایه از بیضه.

**حەوینەوە:** حاوانەوە ف آسوده زیستن.

**حەی:** ١) وشەی سەیرمان؛ ٢) ناوی خوا ف ١) کلمهٔ تعجب؛ ٢) خدا.

**حەیا:** ١) شەرم، فەدی، فهێت؛ ٢) هەتا، تاکو ف ١) حیا؛ ٢) بەشرط.

**حەیات:** ١) ژیان، ماوەی ژیان؛ ٢) خۆش، دڵگر ف ١) حیات؛ ٢) دلنشین.

**حەیاتکان:** ئابڕوچوون ف رسواشدن.

**حەیاتکاو:** ئابرونەماو، بێ‌شەرم ف رسوا.

**حەیاچو:** حەیاتکاو ف رسوا.

**حەیاچون:** ئابڕونەمان، حەیاتکان ف رسواشدن.

**حەیار:** فێڵباز، مەکرباز ف حیله‌گر.

**حەیارە:** ١) پێوانە؛ ٢) بەردەتەرازو ف ١) پیمانه؛ ٢) سنگ ترازو.

**حەیاز:** چقە، پاژنەی کەڵەشێر ف پاشنهٔ پای خروس.

**حەیام:** دەورودەمانە، رۆژگار ف روزگار، زمانه.

**حەیان:** مەعلوم، زانراو: (لێم **حەیانە** تۆدزیوتە) ف عیان.

**حەیب:** ١) شورەیی، عەیب؛ ٢) کەمایەسی: (ماڵەکە بێ‌**حەیبە**) ف ١) عیب؛ ٢) کم و کاست.

**حەیبدار:** زەدەدار، نوقستان ف زدگی.

**حەیبەت:** مەترسی، سام، ترس ف هیبت.

**حەیتە:** ١) زەلامی زلحۆرت، تەژەی ناقۆلا؛ ٢) پیاوی بەردەستی ئاغا؛ ٣) هاواروداد ف ١) لندهور؛ ٢) پیشکار مالك؛ ٣) فریاد.

**حەیچە:** هاواروداد ف فریاد.

**حەی حەی:** وشەی سەیرمان ف کلمهٔ تعجب.

**حەیرا:** کاورا، هۆی فلانکەس ف فلانی

**حەیران:** ١) عاشــق، ئەوینـــدار، بەنــدەوار؛ ٢) هەوای گۆرانـیەکـی بەناوبانگ و لەمێژینە؛ ٣) سەرلێ شێواو ف ١) عاشق؛ ٢) نوعی آواز کردی؛ ٣) حیران.

**حەیز:** بێ‌نوێژی ژن، بەخوێن بونی‌ژن ف حیض.

**حەیزە** ١) هێڵنج ورشانەوە؛ ٢) زگ‌چون؛ ٣) نەخۆشی ئیسقایی ف ١) دل بەهم آمدن؛ ٢) هیضه؛ ٣) استسقاء.

**حەیزەبون:** پیرەژنی فێڵباز ف پیرزن حیله‌گر.

**حەیزەران:** دارێکە لەشوێنی گەرم دەڕوێ وەك قامیشی ناوپردەچێ ف حیزران.

**حەیش:** خۆش رابواردن ف خوشگذرانی.

**حەیشــۆ:** ١) شەرمو شورەیی؛ ٢) بێ‌شەرمی، بێ‌ئابڕویی ف ١) شرم و حیا؛ ٢) بی‌شرمی.

**حەیشە:** حەیچە، دادوهاوار ف فریاد.

**حەیف:** ١) وشــەی خەمباری، بەداخەوە؛ ٢) تۆڵ، تۆڵە ف ١) افسوس؛ ٢) انتقام.

**حەیفێ:** بەداخەوە ف افسوس.

**حەین:** هەروەك، تەواو لەوێنەی ف مثل و مانند.

**حەینە:** وس، وسکوت، بێ‌دەنگ بە ف سکوت کن.

**حەینەن:** حەین ف عیناً.

**حەیوان:** ١) ئاژەڵ، بزن‌ومەڕ؛ ٢) کەرونەفام ف ١) حیوان، دام؛ ٢) احمق و نفهم.

**حەیوە:** بەهێ، بێ، بەی ف میوهٔ به.

**حەیهو:** تۆلەکوێی، چۆن پێك‌دێت ف هیهات.

**حەییەحـەی:** وشەی سەیرمان بەگاڵتە پێ‌کردنەوە ف واژه تعجب برای مسخره کردن.

**حێ:** ناوی پیتێکی ئەلف‌و بێتکە ف «ح» از حروف الفبا.

**حیت:** جۆرێ بزن ف نوعی بز.

**حێجز:** نارەحەت، وەڕەز ف ناراحت.

**حێج:** یەکسمی سەرکێش‌و سل ف ستور سرکش.

**حێدز:** ١) تۆڕە؛ ٢) وەڕەز ف ١) خشمناك؛ ٢) ناراحت.

**حیرس:** رك‌و تورەیی، قەڵسی ف عصبانیّت.

**حیز:** ١) ترسنۆك؛ ٢) ژنی سوك؛ ٣) پیاوی چاوباز ف ١) ترسو؛ ٢) زن تردامن؛ ٣) مرد تردامن.

**حێز:** هێز، وزە، توان ف توان، نیرو.

**حیزاتی:** ترسەنۆکی، ترسونەکی ف بزدلی.

**حیزانە:** ترسەنۆکانە، کاری خوێڕیانە ف از روی بزدلی.

**حیزاوحیز:** ترسەنۆك‌و ترسەنۆك لەراست یەکتر ف دو ترسو در مقابل هم.

**حیزایەتی:** حیزاتی ف بزدلی.

**حیزبگیر:** نامەردانە بەیەخسیر گرتنی کەسێك ف ناجوانمردانه کسی را اسیر گرفتن.

**حیزەبخۆیی:** ژیانی خوێڕیانەو سەرباربون ف با خفت زندگی کردن.

**حێزەت:** قەدر، حورمەت، رێز ف عزت.

**حێزەرقانە:** حیندرحۆ ف الاکلنگ.

**حیزەڵ:** ترسەنۆك ف بزدل.

**حیزی:** کاری نامەردانەکردن، شێوەی حیزان رەچاوکردن ف نامردی کردن.

**حیزیەتی:** حیزایەتی ف بزدلی.

**حیزێتی:** حیزایەتی ف بزدلی.

**حیزی حیزان:** لەترسنۆك ترسنۆکتر ف بسیار ترسو.

**حیساب:** حەساو ف حساب.

**حیســابزان:** ١) زانـا لە ژمـاردندا؛ ٢) عاقـڵ‌و کارلێکدەرەوە ف ١) حسابدان؛ ٢) عاقل و کارآمد.

**حیسابگەر:** ١) لەژمارەدا وریا؛ ٢) حەساوگەر؛ ٣) ئەستێرەناس ف ١) فالگیر با تسبیح؛ ٢) حسابگر؛ ٣) منجّم.

**حیســابگەری:** ١) ئەستێرەناسی؛ ٢) فاڵ گرتنەوەی بەتەزبیح ف ١) منجّمی؛ ٢) فال تسبیح.

**حیش:** زەوینی گڵەسورە ف زمین گِل سُرخ.

**حیشتر:** وشتر، حوشتر ف شتر.

**حیشی:** گوریسی پان‌و درێژ ف طناب پهن و دراز.

**حیفریت:** جندۆکەی زەبەلاح ف عفریت.

**حێق:** هێڵنج ف عق.

**حێك:** جوڵا ف جولا.

**حیکایەت:** حەقایەت، جیرۆك، حەکایەت ف داستان.

**حێل:** ۱) هێز، قەوەت، تاقەت؛ ۲) دەنکێکی زۆر بۆن خۆشە ف ۱) توان؛ ۲) دانەای معطر.

**حێلانێ:** جۆرێ هەڵپەرکێی کچوڵانە ف نوعی رقص دختر بچّەها.

**حیلکانەوە:** بەقاقا پێکەنین، خەنین بەدەنگی بەرز ف قاەقاە خندیدن.

**حیلکوهۆڕ:** خەنینی زۆر و بەدەنگی بەرز ف باصدای بلند خندیدن.

**حیلکە:** دەنگی خەنین، کەن بەدەنگی بەقەو ف قاەقاە خندیدن.

**حیلکەحیلك:** حیلکەی زۆر ف خندە بسیار.

**حیلکەهۆڕ:** دەنگی پێکەنین ف صدای خندیدن.

**حێللانێ:** حێلانێ ف نگا: حێلانێ.

**حێلم:** ۱) برەی مافور؛ ۲) پۆی تەون ف ۱) اضافە نخ قالی کە می‌برّند؛ ۲) پود.

**حیلە:** ۱) دەنگی ئەسپ؛ ۲) گزی، فێڵ ف ۱) شیهە؛ ۲) حیلە.

**حیلەباز:** گزی کەر، فێڵاوی ف حیلەگر.

**حیناوە:** جەنەبازی، زۆر بلێ یی، جەنەجەن ف جانەزدن.

**حینجە:** حونجی، خوێندنەوەی بەسەرو بۆرەوە ف هجّی کردن.

**حینجەت:** بەهانە، پەلپ: (چیم نەکروە، هەرلێم بە **حینجەتە**) ف بهانە.

**حینچك:** کوت، ژەنین ف کلە، فروبردن و برآوردن در هنگام جماع.

**حینچك‌دان:** کوت‌ایدان، کوت پێوەدان، لێ ژەنین ف کلەزدن.

**حینچکە:** حینچك ف نگا: حینچك.

**حیندرحۆ:** حندرحۆ، سیسۆ، جێ جڵقانە ف الاکلنگ.

**حینە:** حیلەی ئەسپ ف شیهە.

**حێول:** حوّل، گێژ، کێل ف گیج.

**حێوەت:** سام، ترس، هەیبەت ف هیبت.

**حێوەکی:** جۆرێ هەڵپەرکێ کچوڵان دەیکەن ف نوعی رقص دختر بچّەها.

**خا:** هێك، هێلكە؛ ٢) هێلكەگون؛ ٣) وشەی ڕێز بۆژن: (**خا** فاتم چۆنی؟) ف ١) تُخم پرنده؛ ٢) خایە، بیضە؛ ٣) کلمۀ احترام برای زن، مُخَفَّف خاتون.

**خابان:** گڵەبان، ئاخەبان، بانەناو ف گِل اندودبام.

**خاپ:** گزی، فێڵ، حیلە ف نیرنگ، حیلە.

**خاپان:** فریو، خەڵەتان ف فریب.

**خاپاندن:** فریودان، خەڵەتاندن، تەفرەدان ف فریب دادن.

**خاپاندی:** فریودراو، خەڵەتاو ف فریب خوردە.

**خاپتانێ:** گاڵتە بەخۆڵ کردنی منداڵان ف خاك بازی بچّەها.

**خاپور:** ١) وێران؛ ٢) چۆمێکە لە کوردستان ف ١) مخروب، ویران؛ ٢) رودی در کردستان.

**خاپۆرە:** گاڵتە بەخۆڵ، خاپتانێ ف خاك بازی.

**خاپـورەوڵات:** وڵاتی وێران بوی کەسی تێدا نەماو ف منطقۀ مخروبۀ خالی از سکنە.

**خاپەروك:** ١) دەغڵ بەباکردن کە لە خۆڵ پاك بێتەوە؛ ٢) پاشەڕوکی ڕەزو بێستان ف ١) باد دادن غلّە؛ ٢) پساچین.

**خاپێن:** فریودەر، هەڵخەڵەتێن ف فَریبکار.

**خاپینۆك:** زۆر دەسبڕ و بەفریو ف بسیار فَریبکار.

**خات:** وشەی ڕێز بۆژنان: (**خات مەلەك**) ف مُخَفَّف خاتون، کلمەاحترام برای زنان.

**خاتر:** ١) دڵ: (**خاترجەم**)؛ ٢) لەبەر، بۆڕێز لەتو: (**خاتری تۆبێ**) ف ١) و ٢) خاطر.

**خاترانە:** بەهۆی دۆستی و خۆشەویستی کردنی کارێك ف خاطر کسی را رعایت کردن.

**خاترجەم:** دڵئاسودە، ئارخەیان ف خاطر جمع.

**خاترخازی:** خواحافیزی، ماڵاوایی ف خداحافظی.

**خاترخوا:** عاشق، ئەویندار ف دلدادە.

**خاترخوازی:** خاترخازی ف خُداحافظی.

**خاترخۆیی:** ١) سەرپشكی، یەکەم‌هەڵبژێری؛ ٢) لەبەر دوستایەتی ف ١) اولّین انتخاب؛ ٢) بخاطر دوستی.

**خاترگرتن:** ڕێزلێنان، حورمەت‌گرتن ف احترام گذاشتن.

**خاترلێ کردن:** تکا لێ کردن ف خواهش کردن.

**خاترناس:** قەدرگر، ڕێزگر ف احترام گذار.

**خاتروخۆتر:** کەین و بەین، لاگیری لەیەکتر ف از هم حمایت کردن.

**خاترێ تە:** خودا حافیز. ماڵیاوا ف خداحافظ.

**خاترێوە:** خوداحافیز لە ئێوە ف خُداحافظ شُما.

**خاتون:** وشەی ڕێز بۆ ژنان ف خاتون، کلمۀ احترام برای خانمها.

**خاتونێ:** وشەی دواندنی خاتون ف کلمۀ خطاب بە خاتون.

**خاتــە:** ١) خات؛ ٢) کەیوانــو، پیاو بەژنی خۆی دەڵێ ف ١) مُخَفَّف خاتون؛ ٢) کلمۀ خطاب مرد بە همسرش.

**خاتێ:** خاتە ف نگا: خاتە.

**خاجە:** بازرگانی گەورە ف تاجر عُمدە.

**خاجــەرۆ:** خازەڵێ، گاڵتـەیەکی شەوانـەی جحێڵانـە ف نوعی بازی دستەجمعی جوانان.

**خاچ:** ١) چەلیپا؛ ٢) ڕاست و بێ ڕاوەستان: (**خاچ‌چو** ناڤائاڤێ) ف ١) صلیب؛ ٢) مستقیم و بدون توقف.

**خاچرکان:** سێ کوچکەی ئاگر ف سەسنگ پایۀ دیگ روی آتش.

**خاچك:** کارگ، گوارگ، قارچك ف قارچ.

**خاد:** خات ف مُخفف خاتون.

**خار:** ١) زەوینــی زۆر سـەخـت؛ ٢) ئەشـکـەوت، شکـەفت؛ ٣) دڕك؛ ٤) ڕاهاتن، بۆکار دەرهاتن؛ ٥) ڕەمل، ڕەڵم، زیخی ورد؛ ٦) خوار ف ١) زمیـن سخـت؛ ٢) غـار؛ ٣) خـار؛ ٤) تربیت شـدە و کـارآمـد؛ ٥) ریگ؛ ٦) کج.

**خارا:** ١) جۆرێ پارچەی بەنرخ؛ ٢) بۆکار ئامادەبو: (چەرمەکە **خاراوە**) ف ١) نوعی پارچۀ قیمتی؛ ٢) آمادە شدە برای استفادە.

**خاران:** لەکار دەرهاتن، ڕاهاتن لەکار ف آمادە برای انجام کار.

**خاراندن:** ۱) راهێنان لەکار؛ ۲) سورکردنەوەی هەوڕ [ف] ۱) آمادە کردن برای کار؛ ۲) سُرخ کردن سُفال.
**خاراو:** ۱) راهاتولەکار؛ ۲) ئیر باری سورەوەکراو [ف] ۱) آمادە شدە برای کار؛ ۲) سُفال سرخ شدە.
**خارچك:** قارچك، کوارگ، کارگ [ف] قارچ.
**خارخار:** لەت لەت، شەقار شەقار [ف] شرحەشرحە.
**خارخارێن:** گرێوەغار [ف] مسابقۀ دو.
**خاردار:** دڕکاوی، بەچقل، دڕواوی [ف] خاردار.
**خاردان:** ۱) غارکردن، راکردن؛ ۲) غارپێ کردن، وەغارخستن [ف] ۱) دویدن؛ ۲) دوانیدن.
**خارز:** ۱) هەرمێشك، هەورێشك؛ ۲) چێشتی میوانی کەلە ئاردو رۆن دەیکەن [ف] ۱) ترید نان گرم و روغن؛ ۲) کاچی.
**خارسك:** ژنەگاور، ژنەفەلە [ف] زن مسیحی.
**خارش:** خورو، ئالۆش، خورانی لەش [ف] خارش.
**خارشت:** خارش، خورین، خرو [ف] خارش.
**خارن:** خواردن [ف] خوردن.
**خارۆرە:** هەراو ئاژاوە [ف] آشوب و بلوا.
**خارۆز:** گەردانە کەلە گوێز دەی هۆننەوە [ف] گردن بندی کە از گردوی نشکستە می‌سازند.
**خاروف:** کوپەی دەم گوشاد [ف] خُم دهانەگشاد.
**خاروك:** پێڵاوی لەگیا چندراو [ف] پای‌افزار از گیاه بافتە.
**خارێز:** ۱) پڕپوڵە؛ ۲) هێلکەورۆن [ف] ۱) آش عدس و ریزەنان؛ ۲) خاگینە.
**خارین:** خاران [ف] نگا: خاران.
**خاریو:** خاراو [ف] نگا: خاراو.
**خاز:** ۱) سوُر، سوّر؛ ۲) کاردو، کاردی؛ ۳) جەغز، جغز؛ ۴) خواز [ف] ۱) قرمز؛ ۲) گیاهی است خوردنی؛ ۳) دایرە؛ ۴) خواهان.
**خازباز:** قالۆچەی کەسك [ف] سوسك.
**خازبێنی:** خواستنی کچ، خوازبێنی [ف] خواستگاری.
**خازتن:** داواکردن [ف] طَلَب کردن.
**خازخازۆك:** خوازە لۆك [ف] گدامنش.
**خازر:** چۆمێکە لە کوردستان [ف] رودخانەای در کردستان.
**خازگینی:** خوازبێنی [ف] خواستگاری.
**خازما:** بەتایبەتی [ف] بویژە.
**خازوق:** سنگێ کە دەکنگی تاوانباریان دەبڕی [ف] جریمەای کە در مورد بزهکار اعمال می‌کردند.
**خازۆك:** سەر سواڵکەر، زۆرشت خواز، خوازەلۆك [ف] گِدامَنش.
**خازەلێ:** خاجەرۆ، گەمەیەکی شەوانەی لاوانە [ف] نوعی بازی گروهی جوانان.
**خازی:** خویز، زوقم، ئالشت [ف] یژ، سرماریزە.
**خازیبار:** قالۆچەی کەسك کە بۆدار زیانی هەیە [ف] سوسك سبز.
**خاژ:** خلیسك [ف] لیز.
**خاژبوُن:** خلیسکان، هەڵ خلیسکان [ف] لیز خوردن.
**خاس:** ۱) باش، چاك، رند، خوُ، تازە؛ ۲) کاهو؛ ۳) گزی، فێڵ [ف] ۱) خوب، پسندیدە؛ ۲) کاهو؛ ۳) فریب.
**خاس بونەوە:** لە نەخۆشی هەستانەوە، چاك بونەوە [ف] شفایافتن.
**خاستر:** چاکتر [ف] بهتر.
**خاسکردن:** چاکردن، چێ کرن [ف] درست کردن، اصلاح کردن.
**خاسگەل:** باشان، چاکان [ف] نیکوکاران.
**خاسما:** بەتایبەت [ف] بویژە، مخصوصاً.
**خاسوُك:** فێڵباز [ف] مُتقلّب.
**خاسە:** ۱) مڵکی دەوڵەت؛ ۲) تایبەتی یەکێك: (**خاسە** تراشی پیروّت)؛ ۳) هەڵبژاردە؛ ۴) گۆشتی پەراسو؛ ۵) پێچە وانەی زڕە: (**خاسە** کەو) [ف] ۱) اموال و املاك دولتی؛ ۲) مخصوص کسی؛ ۳) برگزیدە؛ ۴) عضلات بین دندەها؛ ۵) مُقابل بَدَل، اصل.
**خاسەرەنگ:** ۱) رەنگێ کە ناچێتەوە، رەنگێ کاڵ نابێتەوە، خۆڕەنگ؛ ۲) خاکێکی سوُرە بۆدەرمان و بۆرەنگ دەبێ [ف] ۱) رنگ ثابت؛ ۲) نوعی خاك قرمز رنگ کە مصرف درمانی و رنگرزی دارد.
**خاسەکی:** تایبەتی [ف] ویژە.
**خاسەیی:** تایبەتی [ف] ویژە.
**خاسی:** باشی، چاکی، رندی [ف] خوبی، نیکویی.
**خاسیەت:** رەوشتی تایبەتی، کارتێکردنی تایبەتی بەخۆی [ف] خاصیَّت.
**خاش:** ۱) قاش، کوُز، پارچەیەکی براو لەگندۆرەو شوتی‌و...؛ ۲) نقیمی ئەنگوستیلە؛ ۳) پڕوپوش؛ ۴) زۆر ورد [ف] ۱) قاچ؛ ۲) نگین انگشتر؛ ۳) خَس و خاشاك؛ ۴) بسیار ریز.
**خاشاڵ:** چیلکەو چاڵ، پڕوپوش [ف] خس و خاشاك.
**خاشخاش:** ۱) خاشخاشك، رەبەنۆك؛ ۲) پاوانەی بەزەنگوڵە [ف] ۱) خشخاش؛ ۲) زیورِ پای زنان.
**خاشە:** ۱) روُشان؛ ۲) وردو تێك شکاو، خاش؛ ۳) پڕوپوش [ف] ۱) خراش؛ ۲) خُرد و خمیر شدە؛ ۳) خس و خاشاك.
**خاشیل:** شیوی گەنمەکوتاو کە رۆنی بەسەرا دەکەن، کەشکەکی سەربەرۆن [ف] آش گندم نیم‌کوب و روغن.
**خافڵ:** بێ‌خەبەر، های‌لێ‌نا، بێ‌خەوەر [ف] غافل.
**خافڵان:** سەرقاڵی، ئاگالێ بڕان [ف] سرگرم شدن.
**خافڵاندن:** ۱) سەرقاڵ کردن، سەرلێ‌تێك‌دان؛ ۲) فریودان [ف] ۱) سرگرم کردن؛ ۲) فریب دادن.
**خافوُر:** والا، ناوبەتاڵ [ف] میان‌تهی.
**خاڤ:** ۱) خاو، نەرێسراو؛ ۲) نەکولاو، لێنەندراو؛ ۳) نەگەیشتو، کاڵ [ف] ۱) تاب نخوردە؛ ۲) ناپُختە؛ ۳) کال، نارسیدە.
**خاڤر:** گیایەکە دەرمانی مایەسیری‌یە [ف] گیاهی است داروی بواسیر.
**خاڤك:** ۱) کەلەکە، خاڵیگە؛ ۲) کوتاڵی رزیوی دڕاو؛ ۳) دەسماڵی تەنکی سەری ژنان [ف] ۱) تُهیگاه؛ ۲) پارچۀ پوسیدە؛ ۳) روسری نازك زنانە.
**خاڤلو:** خاولی [ف] هولە.

**خاڤە:** پێستی لەدەباغ نەدراو، پێستی خاو[ف] پوست دباغی نشدە.

**خاڤەکی:** لەشی خاوی داهێزاو[ف] تن سست و بی‌حال.

**خاك:** ئاخ، خۆڵ[ف] خاك.

**خاکاوی:** تۆزاوی، خۆڵاوی[ف] خاك‌آلود.

**خاکبازی:** گاڵتە بەخۆڵ کردن، گەمەکردنی منالاّن بەخۆڵ[ف] خاك‌بازی.

**خاك بەتورەکە کێشان:** بریتی لەوڵات وێران کردن و لەبەین بردن[ف] کنایە از ویران کردن آبادی.

**خاك‌بێژ:** کەو، سەڕەند، هەرچی خۆڵی پێ‌دابێژن[ف] سَرند.

**خاكڕن:** خێشك لەشێوەرد دان[ف] صاف و هموار کردن زمین شُخم شدە.

**خاکری:** خۆڵەکەوە، خۆڵەمێش[ف] خاکستر.

**خاکرێژ:** بەخۆڵ قوڵکە پڕکردنەوە[ف] خاکریز.

**خاکسار:** خاکەسەر، بەلەنگاز، هەژار، بێچارە[ف] خاکسار.

**خاکسەر:** خۆڵەمێش، خۆڵەکەوە، خۆڵی[ف] خاکستر.

**خاکشیر:** گیایەکە دەڵێن دەرمانە[ف] خاکشیر.

**خاك‌نشین:** خاکسار[ف] خاکسار.

**خاك‌وپا:** کەوش و لاق ماچ کردنی گەوران[ف] پایبوسی.

**خاکە:** ۱) وردەو تۆزی قەندو خەڵوزو...؛ ۲) جۆرێ پێشکە[ف] ۱) خاکە؛ ۲) نوعی پشە.

**خاکەچەرمگە:** گڵەسپی کە بۆسواغی دیواری وەتاغی دەکار دەکەن[ف] نوعی خاك سفید کە دیوارها را با آن سفید کنند.

**خاکەڕۆ:** ماڵینی بن خەرمان، گەسکدانی ژێر بەیدەر[ف] خاك‌روبی جای خرمن.

**خاکەڕۆك:** خاکەڕۆ[ف] نگا: خاکەڕۆ.

**خاکەری:** خاکری[ف] خاکستر.

**خاکەساری:** بەلەنگازی، قەرەبەختی، کلۆڵی[ف] خاکساری.

**خاکەلێوە:** ۱) سەرەتای بەهار؛ ۲) هەوەل مانگی بەهار[ف] ۱) اوایل بهار؛ ۲) فروردین ماە.

**خاکەناز:** ۱) مەدونە، بێلۆکەی خۆڵەمێش دەردان؛ ۲) پێمەڕە، بێڵی ئاسن[ف] ۱) خاك‌انداز؛ ۲) بیل.

**خاکەناس:** پێمەڕە، بێلاسن[ف] بیل.

**خاکەنداز:** خاکەناز[ف] نگا: خاکەناز.

**خاکی:** ۱) بەرەنگی خۆڵ، بۆرەڵوکە؛ ۲) بریتی لەمرۆی بێ‌فیزو خۆ بەزل نەزان[ف] ۱) بەرنگ خاك؛ ۲) کنایە از آدم بی‌افادە.

**خاگ:** خاو، نەکوڵاو، نەگەیشتو[ف] خام.

**خال:** ۱) برای دایك؛ ۲) نیشان، نوختەی سەرپێست[ف] ۱) دایی؛ ۲) خال پوست.

**خاڵ:** ۱) لالۆ، لالە، برای دایك؛ ۲) نوختەی سەرپێست؛ ۳) نوختە؛ ۴) رەشانگی ناوبەفر: (**خاڵ بەڵەك**)؛ ۵) لەدوای وشە بەمانای: بەتاڵ، والا: (خشت‌و**خاڵ**)[ف] ۱) دایی؛ ۲) خال پوست؛ ۳) نقطە؛ ۴) زمین خال‌خالی از برف؛ ۵) پسوند بە معنی تُهی.

**خالاّن:** عاشیرەتی خزمی دایك، هۆزی دایك[ف] خویشاوندان مادری.

**خالانە:** قسەی دڵخۆش کەرەی فاڵگرەوە[ف] پیش‌بینی فالبین.

**خالاّنە:** کاری ناشیرین‌و بێ‌شەرمانە[ف] اعمال زشت و ناپسند.

**خاڵ بەڵەك:** ۱) رەشانگی ناوەراستی بەفران؛ ۲) بریتی لە دوهەم مانگی بەهار[ف] ۱) زمین خال‌خالی از برف؛ ۲) کنایە از ماە اردیبهشت.

**خاڵ بەندی:** نوختە لەناو رستە دانان[ف] نقطە‌گذاری عبارات.

**خالتیك:** خوشکی دایك، پور[ف] خالە.

**خاڵخاس:** جوان، لەبەردڵ، بەدەو[ف] زیبا.

**خاڵ خاڵ:** پەڵەپەڵە، زۆرپەڵاوی[ف] خال‌خالی.

**خاڵخاڵك:** ۱) سپڵ؛ ۲) خاڵخاڵۆکە، جانەوەرێکی چکۆڵەی سوری پانکەڵەیە خاڵی رەشی تێدان[ف] ۱) طحال، سپُرز؛ ۲) کفش‌دوزك.

**خاڵخاڵۆك:** خاڵخاڵۆکە[ف] کفش‌دوزك.

**خاڵخاڵۆکە:** ۱) خاڵخاڵۆك؛ ۲) گوڵەستێرە[ف] ۱) کفش‌دوزك؛ ۲) کرم شبتاب.

**خاڵدار:** ۱) کەسێ یا حەیوانێ کە پەڵەی زۆری، بەپێستەوە بێت؛ ۲) ناوی گوندێکە لە کوردستان[ف] ۱) جانوری کە بدنش خال‌خالی باشد؛ ۲) نام روستائی در کردستان.

**خاڵ کوت:** کەسێ کە خاڵی دەسکرد لەپێست نەخش دەکا[ف] خالکوب.

**خاڵ کوتان:** کاری خاڵکوت[ف] خالکوبی.

**خاڵۆ:** برای دایك، لالۆ[ف] دایی.

**خاڵو:** خالۆ[ف] دایی.

**خاڵۆ:** خالۆ[ف] دایی.

**خاڵوان:** خالاّن[ف] خویشان مادر.

**خاڵۆزا:** فرزەندی خاڵ[ف] دایی‌زادە.

**خاڵوزازا:** نەوەی خاڵ[ف] نوۀ دایی.

**خاڵۆزە:** کوێرو، بەڵایەکی گەنمە رەشی هەڵدەگێرێ[ف] سیاهك آفت گندم.

**خاڵۆژن:** ژنی برای دایك، لالۆژن[ف] زن‌دایی.

**خاڵومیل:** ۱) نەخشی مل‌و سینگی کەو؛ ۲) بریتی لە بەخۆدا هاتن‌و جوانتر بونی دڵبەر؛ ۳) رەش کردنی توێڵی منالی ساوا لەترسی چاوزار[ف] ۱) الوان گردن و سینهٔ کبك؛ ۲) کنایە از دلربا شدن معشوق؛ ۳) سیاە کردن پیشانی نوزاد از ترس چشم‌زخم.

**خاڵە:** ۱) وشەی بانکردنی برای دایك؛ ۲) وەستای ئاسنگەر[ف] ۱) کلمهٔ خطاب بە دائی؛ ۲) آهنگر.

**خاڵەخەمە:** کەسێ کە لەخەمی هەموکەس دایە[ف] دلسوز و غمخوار همگان.

**خاڵەڕەشە:** گیایەکە لە کەرەوز دەکاو دارکەکەی رەشە[ف] گیاهی است شبیە کرفس با ساقەهای سیاە رنگ.

**خالی:** مافوُر، قاڵی[ف] قالی.

**خاڵی:** والا، بەتاڵ، بێ‌ناوك، بێ ناوەرۆك[ف] تهی.

**خالیچە:** مافوُری بچوك[ف] قالیچە.

**خاڵی‌خاڵی:** گەمەیەکە پیاو یا ژن دەگەڵ منداڵی دەکەن[ف] نوعی بازی با بچەها.

**خالیس:** پاك، بێ‌خەوش، ساف[ف] خالص.

**خاڵیگە:** کەلەکە، برك، قەبرغە [ف] تهیگاه.

**خام:** ١) خاو، نەرێسـراو؛ ٢) نەکـولاو؛ ٣) قەنەوز، پارچەیەکی بنەوشە، خامەك؛ ٤) قوماشی سپی بۆ کراس و دەرپێ؛ ٥) برێتی لە فەقیروکەم‌زان؛ ٦) چەرمی خۆش نەکراو، چەرمی خاو [ف] ١) تاب نخورده؛ ٢) خام، نپخته؛ ٣) قناویز؛ ٤) مِتقال؛ ٥) کنایه از ساده‌لوح؛ ٦) چرم دبّاغی نشده.

**خاما:** کچ‌عەزەو، کیژێ کە وەختی شوکردنی هاتگە [ف] دختر دم بخت.

**خاماجی:** خالتیك، خوشکی‌دایك [ف] خاله.

**خامبا:** خانەبا، ئاوسانێکی کەمی بێ‌برین [ف] اندك ورم پوست.

**خامك:** بەلمی کونجی، کای‌کونجی [ف] کاه کُنجد.

**خامۆ:** بانکردنی پیاوی گێلۆکە بە تەوسەوە [ف] خطاب کردن شخص هالو.

**خامۆخ:** یەکەم جارئاودانی زرعات [ف] اولین آبیاری زراعت.

**خامۆز:** خامۆخ [ف] نگا: خامۆخ.

**خامۆش:** ١) جێگەی تەنیاو بێ‌هەراو زەنا؛ ٢) مرۆی مات و بێدەنگ؛ ٣) تەمـرانی ئاگر، وەکـوژانی ئێگـر [ف] ١) جـای دِنـج؛ ٢) شخص کم‌حـرف؛ ٣) آتش خاموش.

**خامـۆش‌بون:** ١) بێدەنـگ بون؛ ٢) کوژانـەوەی ئایەر [ف] ١) ساکت شدن؛ ٢) خاموش شدن آتش.

**خامۆش کردن:** کوژاندنەوەی ئاگر [ف] خاموش کردن آتش.

**خامۆشی:** بێ‌دەنگی [ف] سکوت.

**خامۆغ:** هەوەڵین ئاودانی زەرعات [ف] اولین آبیاری کشتزار.

**خامە:** ١) قەڵەم، قەرەم، ئالا، بنوس؛ ٢) تۆڵ، شوڵ [ف] ١) قلم؛ ٢) ترکه.

**خامـەك:** قەنـەوز، خام، پارچـەیەکی بنـەوشی ئامـاڵ سوُرە لەرەنگی ئەرخـەوان دەکـا: (یاخـوا لێت ممبـارەك بێ تافتـەو **خامەك**و خارا) «فولکلور» [ف] قناویز.

**خامەکی:** بەرەنگی خامەك [ف] به رنگ قناویز.

**خامینە:** کاڵەی چەرمی خاو [ف] پاتابه از چرم خام.

**خان:** ١) نازنـاوی دەسەڵات داران؛ ٢) شوێن شوێنی ناو لولەی چەکی گەرم؛ ٣) کاروانسـەرا [ف] ١) خـان، لقب قدرتمنـدان؛ ٢) خان تفنـگ؛ ٣) کاروانسرا.

**خان‌باجی:** خوشکی مێرد، شوُخوشك [ف] خواهرشوهر.

**خان‌چی:** کاروانسەرادار [ف] کاروانسرادار.

**خان‌خان:** ١) چاوەچـاوەی چکـۆڵـە لە هەزار پیشـەدا؛ ٢) خەت‌خەتی چوارگۆشـە لەتەختەی دامەو شەترنج دا [ف] ١) و ٢) خانه خانه‌های متعدد و پهلوی هم روی صفحهٔ شطرنج و...

**خان خانەکێ:** حوکمات کردنی سەر هۆزان [ف] خان‌خانی.

**خاندوك:** بنی گیایەکە [ف] ریشهٔ گیاهی است.

**خانـك:** ١) پنـە، تەختەیەکە ئەنگوتکی لەسەر پان‌دەکەنەوە؛ ٢) زەمیلە، زەنبیلە؛ ٣) خانوُ، ماڵ [ف] ١) تخته‌ای که چونه را برآن پهن کنند؛ ٢) زنبیل؛ ٣) خانه، سرا.

**خانگ:** ماڵ، خانو [ف] خانه، سرا.

**خانگار:** خانەنشین و لە پیری لە کار کەوتە [ف] پیر خانه‌نشین.

**خانم:** ١) وشـەی ڕێز بۆ ژن؛ ٢) ئەی گەورەی من! [ف] ١) خانم، کلمـهٔ احترام برای زنان؛ ٢) بُزرگِ من!

**خانم‌بی:** لەرزانە، خشڵێکی سەری ژنانە [ف] زیوری است زنانه.

**خانوُ:** ماڵ، خانگ [ف] خانه، سرا.

**خانوُبەرە:** خانوُی گەورە [ف] خانهٔ بزرگ.

**خانوُت:** ١) جۆڵا؛ ٢) کاری جۆڵا، جۆڵایی [ف] ١) جولا؛ ٢) پیشهٔ جولا، جولایی.

**خانوچکە:** ماڵۆکەی لەخۆڵ کە منداڵان لەگەمەدا سازی دەکەن [ف] خانه گلی که کودکان سازند.

**خانوُلە:** خانوچکە [ف] نگا: خانوچکه.

**خانومان:** شۆخ و شەنگ، جوان و دڵگر [ف] شوخ وشنگ.

**خانە:** ١) ماڵ؛ ٢) چـاوەی هەزارپیـشە؛ ٣) خەت‌دراوی چـوارگۆشە [ف] ١) خانه؛ ٢) خانه‌خانه‌های پهلوی هم؛ ٣) چهارگوشه.

**خانـەبـا:** ١) برێتی لە جوُڵـەو بزوتنـەوەی سەبری ئەندام؛ ٢) ئەستور بونێکی کەم، خانەما [ف] ١) کنایه از حرکت آرام اندام؛ ٢) وَرَم اندك.

**خانەخانە:** خان‌خان [ف] نگا: خان‌خان.

**خانـەبگیر:** کەسێ کە دەمـاڵە خۆیدا یەخسیری بکەن [ف] کسی که در خانهٔ خود دستگیرش کنند.

**خانەبەکۆڵ:** رەبەن، بێ‌ماڵ‌وحاڵ [ف] خانه‌به‌دوش.

**خانەبێزار:** لەماڵە خۆی وەرەز [ف] از خانه خود بیزار.

**خانـەخـراپ:** ١) مـاڵ‌وێـران؛ ٢) برێتـی لە بێ‌بەخـتو کڵۆڵ [ف] ١) خانه‌خراب؛ ٢) کنایه از بدشانس.

**خانەخوێ:** خاوەنی ماڵی بەمیوان [ف] میزبان.

**خانەخوێگ:** خانەخوێ [ف] میزبان.

**خانەدان:** ١) نەجیم‌زادە، بنیچـە عەسڵ؛ ٢) ماڵی گەورەی بەمیوان [ف] ١) نجیب‌زاده؛ ٢) خانهٔ بزرگ پُرمیهمان.

**خانەزا:** نۆکەر کە لەماڵە ئاغاکەی‌دا لەدایك بوبێ [ف] خانه‌زاد.

**خانەزاد:** خانەزا [ف] خانه‌زاد.

**خانەزاو:** خانەزا [ف] خانه‌زاد.

**خانەزای:** خانەزا [ف] خانه‌زاد.

**خانەژوُرە:** وشەی داکردنی مریشك کە بچنە کولانەوە [ف] جاجا، کلمهٔ راندن مرغ به لانه‌اش.

**خانەشاری:** دەس بەسەر لە ماڵەخۆیدا، ژێر چاوێری پیاوی دەوڵەت [ف] تحت‌المراقبه، تحت نظر.

**خانەقا:** دەروێش‌دان، سۆفی‌گە، تەکیە [ف] خانقاه.

**خانەکولانە:** خانەژوُرە [ف] جاجا.

**خانەکی:** ماڵی، کەدی [ف] خانگی، اهلی.

**خانەگا:** خانەقا [ف] خانقاه.

**خانەگومان:** دڵ‌پیس لەژن [ف] از همسر بدگمان.

**خانەمیری:** جۆرێ ترێ [ف] نوعی انگور.

**خانەنشین:** ١) گردەنشین، کەسێ کە لەبەرپیری یان نەخۆشی نەتوانێ

لەماڵ دەرکەوێ؛ ۲) کەسێ بەحوکمی دەوڵەت نەتوانێ لەماڵ دەرکەوێ ف ۱) افتاده و خانەنشین؛ ۲) تحت نظر دولت.

**خانەوادە:** ۱) ماڵەگەورە؛ ۲) تیرەو تایفە ف ۱) خانۀ ثروتمندان؛ ۲) طایفه، عشیرت.

**خانەوخان:** ۱) بانەوبان؛ ۲) ماڵەوماڵ ف ۱) از بامی به بام دیگر پریدن؛ ۲) از خانه‌ای به خانۀ دیگر رفتن.

**خانی:** ۱) ماڵ، خانو؛ ۲) کانی، سەرچاوە؛ ۳) نازناوی شاعیری بەناوبانگ ئەحمەدی خانی ف ۱) خانه؛ ۲) سرچشمه؛ ۳) تخلص یکی از شعرای بزرگ کُرد.

**خانێ:** ۱) شارێکە لە کوردستان؛ ۲) بانگ کردنی خانم بەحورمەتەوە ف ۱) شهری در کردستان؛ ۲) صداکردن خانم با احترام.

**خانیان:** هۆزێکی کوردە کە*خانی*شاعیر سەربەوە ف عشیرتی است که «خانی» شاعر کرد از آن طایفه است.

**خاو:** ۱) خەو، نوستن؛ ۲) سستو بێهێز؛ ۳) نەکوڵاو؛ ۴) جێگەی ماڵاتو یەکسم لە زستاندا کە قەڵەو بکرێ؛ ۵) نەگەیشتو، کاڵ؛ ۶) نەرێسراو؛ ۷) چەرمی خۆش نەکراو؛ ۸) بنەمای کەرستە؛ ۹) گیاوگوڵێکی زۆر بۆنخۆش: (لەکن وەنەوشەو خاوو هەڵاڵو بەیبونی / هەڵاڵی پێستەیی خاوە عەبیرو موشکی خەتا) «حاجی»؛ ۱۰) پارچە گۆشتێکە لەناو ریخۆڵاندا. دەبرژێندرێ؛ ۱۱) پرزەی شاڵ و قاڵی ف ۱) خواب؛ ۲) سُست، بی‌حال؛ ۳) نپُخته؛ ۴) جای پروردن پرواری؛ ۵) کال، نارس؛ ۶) نتابیده، ناتنیده؛ ۷) چرم دَبّاغی نَشده؛ ۸) موادخام؛ ۹) گُل گیاه بسیار خوشبوی؛ ۱۰) قطعه‌ای گوشت عضلانی در احشای بدن؛ ۱۱) پرز شال و قالی.

**خاوالی:** خەواڵو ف خواب‌آلود.

**خاوان:** ۱) مژول‌بون؛ ۲) خۆخافڵاندن ف ۱) مشغول شدن؛ ۲) خود را سرگرم کردن.

**خاواندن:** مەشغوڵ کردن، خافڵاندن ف مشغول کردن.

**خاوانن:** خاواندن ف سرگرم کردن.

**خاوانە:** فرێت، داوی پۆ لەتەوندا ف پود قالی.

**خاوبونەوە:** ۱) شل‌بونەوەی بادراو؛ ۲) برێتی لە شل‌بونەوە لە کارێك؛ ۳) نەرم‌بونی چەرمی وشكهەڵاتو لە ئاودا ف ۱) تاب برگشتن، خام‌شدن؛ ۲) کنایه از بی‌حوصله‌شدن؛ ۳) نرم شدن چرم خشك.

**خاوپەڕ:** نیوەبادراو، تەواو بانەدراو ف نیم‌تابیده.

**خاوڕۆن:** هێلکەوڕۆن ف نیمرو.

**خاوڕۆن:** هێك‌وڕون، خاوڕۆن ف نیمرو.

**خاوزان:** لێکدەرەوەی خەون ف تعبیرکنندۀ خواب.

**خاوس:** خواس، پێخواس، بێپێڵاو ف پای برهنه.

**خاوك:** ریسێك کە درەنگ بادەخوا ف رشته‌یی که به سختی تاب می‌خورد.

**خاوکردنەوە:** ۱) نماندنی چەرم لەئاودا، خوساندنی چەرم؛ ۲) لەبادراوی ڕەواندنەوە ف ۱) خیساندن چرم در آب؛ ۲) خام کردن تابیده.

**خاوکەر:** قامێکی زۆر بەناوبانگە ف از آهنگهای مشهور کردی.

**خاوکەرەوە:** ۱) شل‌کەرەوە لە مەبەست؛ ۲) چەرم بەئاو نەرم‌کردنەوە؛ ۳) بادراو خاوکردنەوە ف ۱) از تصمیم منصرف کننده؛ ۲) چرمِ در آب خیسانده شده؛ ۳) تابیده را به خامی برگردانده.

**خاولی:** پشتەماڵ، مەرحەمە ف حوله.

**خاون:** خاوەن، خودان، خێو، ساحێب ف صاحب، خداوند.

**خاونامە:** کتێبی خەون لێکدانەوە ف کتاب تعبیر خواب.

**خاووخلیچك:** ۱) شل‌ووڵ، نەبەگە؛ ۲) تام ناخۆش و لیچق ف ۱) شُل و ول؛ ۲) لَزج و بدمزه.

**خاووخلیسك:** خاو و خلیچك ف نگا: خاووخلیچك.

**خاووخێزان:** ژن‌و منداڵ، وردەو یەخسیر، هەمو خەڵکی ماڵ ف همۀ افراد خانواده.

**خاوە:** ۱) پیتاکی میری؛ ۲) کەرانە، قەرەبوی مامڵە پەشیمانی؛ ۳) سەرانە بۆ شەلاتی زۆردار؛ ۴) لکی تازەلەلق ف ۱) باج؛ ۲) پول پرداختی بدلیل پشیمانی از معامله؛ ۳) باج سبیل؛ ۴) جوانه تازه بیرون زده.

**خاوەخاو:** ۱) تەمەڵی‌و خۆدزینەوە لەکار؛ ۲) بڕەی تەون؛ ۳) گیای‌خاو کە مەشکەی پێ دەهەنون ف ۱) تنبلی و شُل‌بازی؛ ۲) کُرك اضافۀ قالی؛ ۳) گیاهی است.

**خاوەر:** ۱) خۆرهەڵات، ڕۆژهەڵات؛ ۲) ناوە بۆژنان ف ۱) خاور، مشرق؛ ۲) از نامهای زنان.

**خاوەرزەمین:** وڵاتی ڕۆژهەڵاتی ف مشرق‌زمین.

**خاوەمێ:** ماستی شلی شیرنەکوڵاو بۆ مەشکە ف ماست آبکی مخصوص مشك.

**خاوەن:** خاون ف صاحب.

**خاوەناش:** ۱) ئاشەوان، ئاسیاوان؛ ۲) فریوی‌دا، هەڵی‌خەڵەتاند ف ۱) آسیابان؛ ۲) او را فریب داد.

**خاوەن‌چاکە:** خێرەومەند، بەپیاوەتی ف نیکوکار، خیّر.

**خاوەند:** خاون ف صاحب.

**خاوەندار:** بەساحب ف دارای صاحب.

**خاوەنداری:** سەرپەرشتی ف سرپرستی.

**خاوەن‌زۆر:** بەدەستەڵات، توانا ف قدرتمند، بانفوذ.

**خاوەن‌شکۆ:** نازناوی پاتشایانە ف لقب پادشاهان.

**خاوەن فەرمان:** ۱) دەسەڵات‌دار؛ ۲) خاوەن کار ف ۱) فرمانروا؛ ۲) کارفرما.

**خاوەن‌قەرز:** کەسێ قەرز دەدا بەقەرزدار ف بستانکار.

**خاوەن کار:** کەسێ کەکار بەکرێکاران دەکا ف کارفرما.

**خاوەن‌ماڵ:** ۱) خانەخوێ؛ ۲) ساحێب‌خانو ف ۱) میزبان؛ ۲) صاحب‌خانه.

**خاوەن‌ناو:** بەناوبانگ، بەناوودەنگ، مەنشور ف مشهور.

**خاوی:** ۱) شلی‌و تەنبەڵی؛ ۲) کاڵی، نەگەیشتویی؛ ۳) نەکوڵاوی ف ۱) شُلی، تنبلی؛ ۲) خامی، نارسی؛ ۳) ناپختگی.

**خاوێر:** خەو بردنەوە، نێوان بێداری‌و خەو ف پینکی.

**خاوین:** خەوخەو، کەسێ کە زۆر دەخەوێ ف پرخواب.
**خاوێن:** پاك، پاقژ، تەمیس ف پاکیزه.
**خاوێنی:** پاکی، پاقژی، پاکژی، تەمیزی ف پاکیزگی.
**خایاندن:** پێچونی وەخت: (ئەمکارە دوورۆژی **خایاند**) ف صرف وقت کردن.
**خایانن:** خایاندن ف صرف وقت کردن.
**خاین:** غەیان، بێ بەخت ف خائن، خیانتکار.
**خایە:** ۱) هێلکەی مەل، خا؛ ۲) هێلکەی گون ف ۱) تخم پرنده؛ ۲) بیضه.
**خایەرۆن:** خاورۆن، هێك ورون، هێلکەورۆن ف نیمرو.
**خایەن:** غەیان، بێ بەخت ف بدشانس.
**خایەنراو:** وەدرەنگ کەوتوُ ف بەتأخیر افتاده.
**خایەومـایە:** هەرچی هەیە، هەست و نیست، هەرچی داراییە ف هرچه هست، همەچیز.
**خاییبە:** خاوورۆن ف خاگینه.
**خپ:** کڕومات، بێ دەنگ و بێ بزوتن ف ساکت و بی حرکت.
**خپر:** ۱) کۆلینەوە؛ ۲) کۆلین ف ۱) و ۲) کنکاش.
**خپـشـەمـلـە:** ۱) ملهوڕ، مل ئەستـوُر؛ ۲) زۆردارو لەخـۆ بـایی ف ۱) گردن کلفت؛ ۲) توانا و مغرور.
**خپ کردن:** بۆیەکجاری بێدەنگ کردن. برێتی لە کوشتن ف کنایه از کُشتن.
**خپلاك:** دەرك و پەنجـەرەی شەق و شڕ و لەکـارکـەوتـو ف در و پنجرهٔ مستعمل و از کار افتاده.
**خپلە:** کورتەبالای قەلەو ف کوتولهٔ چاق.
**خپـە:** خۆ لەشتێك مات کردن، بەدزیەوە دەبـەرچـاو گرتن ف زیرنـظر داشتن، از زیر مراقب بودن.
**خپە کردن:** خۆمات کردن لە سوچێك ف آرام در گوشه‌ای خزیدن.
**خپ هەلاتن:** بۆیەکجاری لەبزوتن کەوتن ف یکباره از حرکت افتادن.
**خت:** ۱) خپ، بێ دەنـگ و جوڵـە؛ ۲) بێ هوُدەو خۆڕایی؛ ۳) وشـەی دەرکردنی پشیلە ف ۱) بی سروصدا؛ ۲) بیهوده؛ ۳) کلمه‌ای که برای راندن گربه گویند.
**ختتە:** وشەی دەرکردنی پسیك ف کلمه‌ایست برای راندن گربه گویند.
**ختك:** پشیلە، پشی، پسیك ف گربه.
**ختکە:** قانەقدی، قدیلکە ف قلقلك.
**ختکی:** ختکە ف قلقلك.
**ختکینە:** هانەدەر، دنەدەر ف تشویق کننده.
**ختل:** خپلە ف کوتاه‌قد و چاق.
**ختۆکە:** ختکە ف قلقلك.
**ختۆکەدان:** قدیلکەدان ف قلقلك دادن.
**ختولکە:** ختکە ف قلقلك.
**ختە:** ختتە ف نگا: ختته.
**ختەخت:** لێدانی دڵ لە نیگەرانی ف بەتپش افتادن قلب از نگرانی.

**ختـەدان:** ۱) بزاوتن، دنـەدان؛ ۲) قدیلکەدان ف ۱) تحریك و تشویق کردن؛ ۲) قلقلك دادن.
**ختێ:** ۱) پشیلە؛ ۲) قدیلکە ف ۱) گربه؛ ۲) قلقلك.
**ختیرە:** بەیسوس، بزوت، چوڵەچرا ف نیم سوز.
**ختیك:** چڵمی وشکەوە بو بەلوُتەوە، کەمێلە ف خلم.
**ختیلکە:** قدیلکە ف قلقلك.
**ختێنە:** ختەدان، بزاوتن ف تحریك.
**خجل:** خەریك ف سرگرم کار، مشغول.
**خج:** دەرکراو لەبازی ف از بازی بیرون شده.
**خجان:** دوڕان ف باخت.
**خجاندن:** دوڕاندن ف باختن.
**خج خج:** وشەی دەر کردنی رەشە ولاغ، وەحاوەحا ف واژه‌ای برای راندن گلهٔ گاو و گاومیش.
**خجۆخجۆ:** وشەی بانگ کردنی رەشە ولاغ بۆهێنانەوە ف واژه‌ای برای خواندن گلهٔ گاو و گاومیش.
**خدام:** کارەکەر، کلفەت، جێڕی ف کُلفَتْ.
**خدامە:** خدام ف کُلفَتْ.
**خدران:** گونـدێکی کوردستـانـە بەعـسی وێرانی کرد ف روستـایی در کردستان عراق که به وسیله بعثیها ویران شد.
**خدرجیجـە:** گونـدێکی کوردە بەعسی وێرانی کرد ف روستـایی در کردستان عراق که بەوسیله بعثیها ویران شد.
**خدر وەلـی:** گونـدێکی کوردە بەعسی وێرانی کرد ف روستـایی در کردستان عراق که بەوسیله بعثیها ویران شد.
**خدرەلیاس:** شازدەی مانگی رەشەمە: (**خدرەلیاس** سەرما خەلاس) ف شانزدهم اسفند.
**خدریك:** گوندێکی کوردە بەعسی وێرانی کرد ف روستایی درکردستان عراق که بەوسیله بعثیها ویران شد.
**خدوُك:** قدیلکە ف قلقلك.
**خدۆك:** نەزیلە، کورتە چیرۆك ف داستان کوتاه.
**خدوُکە:** قدیلکە ف قلقلك.
**خدە:** خوُ، رەوشت، ئاکار ف خوی و روش.
**خدێ:** خدە ف خوی و روش.
**خدیك:** خدە ف خوی و روش.
**خدیکە:** قدیلکە ف قلقلك.
**خڕ:** ۱) کۆ، کۆم: (لـەچی **خڕ** بونەوە؟)؛ ۲) هەمو، گش؛ ۳) گر، گرۆفەر: (تۆپی زەوی **خڕە**)؛ ۴) شتی کەمەیی: (کەللە بێژنگ **خڕە**)؛ ۵) ئاودڕ، جێ لافاو؛ ۶) شیوەڵە؛ ۷) گرێ لە پێستدا، هەڵتۆقین: (بن پیلم **خڕ**بوەدەبێتـە کوان)؛ ۸) چوڵ، لەگەڵ خالی دەیلێن: (بیابانی **خڕو** خالی)؛ ۹) دەگەڵ خوڵ واتـا: جوان: (**خڕوخوڵ**) ف ۱) اجتماع؛ ۲) همگی، همه؛ ۳) کُروی، گِرد؛ ۴) دائره‌مانند؛ ۵) آبکند، مسیل؛ ۶) درّهٔ تنگ؛ ۷) غدهٔ زیر پوست؛ ۸) مُترادف خالی؛ ۹) زیبا.
**خرا:** ۱) هاوێژرا، فڕێدرا: (لاشە **خرایە** ناو خەرەندەوە)؛ ۲) داندرا: (بار

**خوز:** ۱) کوڕ، پشت چەماو؛ ۲) چرچ و لۆچ؛ ۳) شوێنی قولاغەدانی ماسی، خزگەماسی؛ ۴) تف، لیکاو؛ ۵) چین، لالەسەرلا ف ۱) کوژپشت؛ ۲) چین‌وچروك؛ ۳) پناهگاه ماهیان؛ ۴) آب دهن؛ ۵) چین‌وشکن.

**خۆز:** ۱) قوزاخەی پەمۆ؛ ۲) هەربەری دارێك كە قۆاخەیی بێ وەك سنەوبەرو... ف ۱) غوزهٔ پنبه؛ ۲) ثمر هر درختی كه غوزه داشته باشد.

**خوُز:** ۱) هێز، توانا، وزە؛ ۲) خوُس، خوسار، زوقم؛ ۳) ناپەسند؛ ۴) کوم، پشت‌چەماو؛ ۵) ئەوك، قورگ ف ۱) نیرو، توان؛ ۲) سرماریزه؛ ۳) ناپسند؛ ۴) کوژ؛ ۵) گلو.

**خوزار:** مێوە، میوە، فێقی، فێکی ف میوه.

**خوزتێ گەڕان:** بوژانەوە، وەكەیف هاتن دوای لاوازی ف دوباره نیروگرفتن.

**خوزتێگەڕانەوە:** بوژانەوە، وەهێزكەوتن دوای نەخۆشی ف دوباره نیرو گرفتن.

**خۆزگا:** خۆزیا، بریا، كاشكا، بری ف ای كاش.

**خوزگە:** خزگەی ماسی ف پناهگاه ماهیان.

**خۆزگە:** خۆزگا ف كاشكی.

**خۆزگەبردن:** ئاوات خواستن، ئارەزوكردن ف آرزوكردن.

**خۆزگە بەتۆ:** بریا وەك تۆ بام ف خوش بەحالت.

**خۆزگە خواردن:** خۆزگەبردن ف آرزوكردن.

**خوزە:** ۱) خزگەماسی؛ ۲) خوسار، زوقم، خویس ف ۱) پناهگاه ماهیان؛ ۲) سرماریزه، پُژ.

**خوز هێنانەوە:** ۱) ساریژ بونەوەی برین؛ ۲) جوش خواردنەوەی پێشەی شكستە ف ۱) التیام زخم؛ ۲) جوش خوردنِ استخوان شكسته.

**خوزی:** تف، لیكاو ف آب‌دهن.

**خۆزی:** خۆزگا ف ای كاش.

**خۆزیا:** خۆزگا ف كاشكی.

**خوزیان:** پەسندنەكردن ف نپسندیدن.

**خوُژ:** كوڕ، پشت چەمیاگ ف كوژ پشت.

**خوژە:** گیائەسرێلك، گیاچرێش ف گیاه سریش.

**خوژێلك:** خوشیلك، گیایەكی بەرزە بالای شیردارە، گەڵاكەی لەگەڵای داربی دەكا ف گیاهی بلندقد با برگهائی شبیه برگ بید.

**خوژین:** نركە نرك، دەنگی هەناسەدانی ماندگ ف صدای نفس زدن شخص از خستگی.

**خوس:** وست، بێدەنگ‌بە، وشەی فەرمان ف هیس.

**خۆس:** شوُسەوە، شوُڵی سەبەتەچنین ف تركهٔ سبدبافی.

**خوُس:** ۱) خوسار، زوقم؛ ۲) نماندن، تەڕكردن بۆ نەرم‌بون ف ۱) پُژ، سرماریزه؛ ۲) خیساندن.

**خوُسا:** نەرمەوەبو لە ئاوا ف از خیسی نرم شد.

**خوسار:** زەرەر، زیان: (تە چێلا خۆفرۆت **خوسار** كر) ف ضرر، زیان.

**خوُسار:** خوُس، زوقم ف پُژ، سرماریزه.

**خوُسان:** لەئاودا نەرم‌بون، نمان ف در آب نرم شدن.

**خوُساندن:** لەئاودا نەرم‌كردن، نماندن ف در آب نرم كردن.

**خوُساندنەوە:** دوبارە خوُساندن ف دوباره خیساندن.

**خوُساو:** دەئاودا نەرم‌كراو ف در آب نرم شُده.

**خوسپ:** غەیبەت، پاش ملەگوتن ف غیبت.

**خوست:** ۱) جوُڵە، بزوتن: (هەست‌و **خوست**)؛ ۲) داوێن ف ۱) كمترین حركت؛ ۲) دامن.

**خۆستۆخ:** داواكەر، خوازەلۆك ف سائِل.

**خوستە:** خوست: (هەر **خوستەی** نایە) ف كمترین حركت.

**خۆستی:** داوا كاری كچ بۆئەوە ببێتەژنی ف خواستگار دختر.

**خوسرەو:** ناوە بۆپیاوان ف نام مردانه.

**خۆسسی:** خەسوُ، داڵكی هاوسەر ف مادر همسر.

**خوسڵ:** عوسڵ، مەلەی دەركردنی لەش‌پیسی ف غُسل.

**خوسم:** پێنج یەكی داهات كە دەدرێ بە موشتەهید ف خُمس.

**خوسن:** جوێن، جنێو، دژمان، سخێف ف دُشنام.

**خۆسن:** خوسن ف دُشنام.

**خوسوُسی:** تایبەتی ف ویژه، خصوصی.

**خوسە:** كەسەر، خەم، غەم، مەینەت ف غُصّه.

**خۆسەر:** خودسەر ف خودسَر.

**خۆسەری:** سەربەخۆیی ف خودسری.

**خوُسیاگ:** خوُساو ف خیسیده.

**خوُسیان:** ۱) خوُسان؛ ۲) خۆدان، خۆهدان، ئارەق كردن ف ۱) خیسیده؛ ۲) خیس عرق شدن.

**خوش:** ۱) دەنگی تیژی تراوی كەم: (**خوش خوش** دەمیزێ)؛ ۲) دەنگی شیر لە دۆشیندا ف ۱) صدای شُرشُر مایعات؛ ۲) صدای دوشیدن شیر حیوان.

**خۆش:** ۱) چێژەی پەسند؛ ۲) ئامادەكردنی چەرم بۆ دەكار كردن: (چەرمەكەم **خۆش** كردوە)؛ ۳) بۆنی پەسند: (ریحانەی بۆن **خۆش**)؛ ۴) دەمی بێ‌باران؛ ۵) ساغ و سلامەت؛ ۶) كژو هەوای پەسند: (ولاتی ئاوو هەوا **خۆش**)؛ ۷) پەلە، لەز: (**خۆش** برۆ)؛ ۸) توندی با؛ ۹) بەگڕبونی ئاگر ف ۱) طعم لَذیذ؛ ۲) دباغی و آماده كردن چرم برای استفاده؛ ۳) رایحهٔ مطبوع؛ ۴) موسم بی‌باران؛ ۵) سلامت و تندرست؛ ۶) هوای معتدل؛ ۷) عَجَله، شتاب؛ ۸) شدّت وزش باد؛ ۹) آتش شعله‌ور.

**خۆشا:** خۆزگەبە ف خوشا.

**خۆشاب:** خۆشاو، ئاوی مێوژو مێوەی وشكی خوُساو ف كشمش و میوه خشك خیسانده در آب.

**خۆشاتن:** بەخێرهێنان ف خوشامدگویی.

**خوشار:** گوشین، رێك هێنان، تەوژم دان ف فِشردن.

**خۆشاردنەوە:** خۆوەشارتن، خۆ لەخەڵك وْن‌كردن ف خود را پنهان كردن.

**خۆشارنەوە:** خۆشاردنەوە ف خود را پنهان كردن.

**خۆشاو:** خۆشاب [ف] نگا: خۆشاب.

**خۆشاواز:** دەنگ خـۆش: (نەقـازە، نەبـازە، بولـبولی **خـۆشاوازە**) [ف] خوش اواز.

**خۆشباوەڕ:** ساویلکە، دڵساف، بێ فێڵ و فەرەج [ف] خوش باوَر.

**خۆشبای:** ساغ بی، سەلامەت بی، خۆش بی [ف] خوش باشی.

**خۆش بن:** ۱) ئێوە ساغ بن؛ ۲) بەسەرخۆشی رای بوێرن [ف] ۱) تندرست باشید؛ ۲) بەمستی بگذرانید.

**خۆش بوُران:** خۆش رابوار دن، کەیف کردن [ف] خوشگذرانی.

**خۆشبـوُن:** ۱) شیاوی خواردن بوُن: (میوە **خۆش بوُە**)؛ ۲) ئامـادە بوُنی چەرم بۆ دەکـارکـردن؛ ۳) عافـوکردن و لێ بوُردن؛ ۴) چاك بوُنەوە لە نەخـۆشی؛ ۵) قوڕی شیاوی سواغ بوُن [ف] ۱) قابـل خوردن شُدن؛ ۲) آمـادە شدن چـرم بـرای استفـادە؛ ۳) بخشیـدن. عفـو کـردن؛ ۴) شفایافتن، بهبودی؛ ۵) سرشته شُدن کاهگل.

**خـۆشبـوُنـەوە:** ۱) چـاك بـونەوە لە نەخـۆشی؛ ۲) ئاشت بـوُنەوە [ف] ۱) شفایافتن؛ ۲) آشتی کردن.

**خۆش بە:** ۱) خەمت نەوێ؛ ۲) مەس بە [ف] ۱) شادباش؛ ۲) مَست باش.

**خۆش بەخت:** بەختەوەر، بەختیار، بەسعود [ف] خوشبخت.

**خۆش بەز:** ئەسپ یان کەروێشکی تیژڕۆ [ف] بادپا.

**خۆش بی:** ساغ و بەدەماخ بی [ف] شاد و تندرست باشی.

**خۆش بێژ:** دەنگ خۆش [ف] خوش آواز.

**خۆش بین:** دور لە ناهومێدی، هەر بەهومێد [ف] خوش بین.

**خۆش پۆش:** تەڕپۆش، کەسێ کە جلکی تازەو جوان دەبەر دەکا [ف] شیك پوش.

**خۆشـتن:** ۱) شوتنی لەش؛ ۲) برێتی لە خوسـڵ کردن [ف] ۱) خود را شُستن؛ ۲) کنایە از غُسل کردن.

**خۆشتەوی:** خۆشەویست، لەبەردڵ [ف] محبوب.

**خۆشحاڵ:** رازی، بەکەیف [ف] خوشحال.

**خۆشخـانـە:** دەبـاغ خانە، هەڵاڵ خانە، ئەوشوێنەی چەرمی تێدا خۆش دەکەن [ف] کارگاهِ دبّاغی.

**خۆشخوُ:** ئاکارباش، خدەپەسند، دژی بەدخو [ف] خوش اخلاق.

**خۆش خوان:** دەنگ بێژ، خۆش بێژ، دەنگ خۆش لە گۆرانی گوتندا [ف] خوش آواز.

**خـۆش خـۆر:** ۱) کـەسـێ خـۆراکـی باش دەخـوا؛ ۲) زۆرخـۆر [ف] ۱) خوش خوراك؛ ۲) پُرخور.

**خوش خوش:** دەنگی دۆشێنی شیر بەشوێن یەکا [ف] صدای دوشیدنِ شیر.

**خۆش خۆش:** ۱) پەلـەپەل، بلەز؛ ۲) زۆر بەتام، زۆر چێژەخۆش؛ ۳) زۆر بەلەزەت [ف] ۱) باعَجَله؛ ۲) بسیار لذیذ؛ ۳) بسیار شادی‌آفرین.

**خـوش خـوشك:** ۱) لـوُ، گـرێ گـۆشت؛ ۲) سپڵ [ف] ۱) غُدّهٔ داخلـی؛ ۲) طحال، سِپُرز.

**خوش خوشکە:** سپڵ [ف] طحال، سِپُرز.

**خۆش خەبەر:** مژدەدەر، مژدەهێن، بەمزگێنی [ف] خوش خبر.

**خۆش خەوەر:** خۆش خەبەر [ف] خوش خبر.

**خۆش دەماخ:** کەیف ساز، دڵشاد [ف] سرحال، خوشحال.

**خۆش دەڤ:** راوێژ شیرین، قسەخۆش [ف] خوش صحبت.

**خۆش ڕو:** روُخۆش، روگوشاد، دژی مڕوموّچ [ف] بَشّاش.

**خۆشڕۆ:** ۱) لەڕەوتا بەکار؛ ۲) فێری ڕەوتی پەسند کراو [ف] ۱) بادپا؛ ۲) تعلیم دیده در دُرُست راه رفتن.

**خۆش ڕەفتار:** بەئاکار، ئاکارچاك [ف] خوش رفتار.

**خۆشڕەو:** خۆشڕۆ [ف] تُندرو.

**خۆش زوان:** زمان خۆش [ف] شیرین زبان.

**خۆش زوبان:** خۆش زوان [ف] شیرین زبان.

**خۆش قەدەم:** پێ بەودم، پێ و قەدەم ممبارەك [ف] خوش قدم.

**خوشك:** خوێشك، خوچ، خوەیشك، خوار، خوەه [ف] خواهر.

**خۆشکان:** دۆڵێك و گوندێکە لەولاتی باڵەکاتی لەکوردستان [ف] نام درّە و دهکده‌ای در کُردستان.

**خوشکایەتی:** ۱) پەیوەندی دوخوشك پێکەوە؛ ۲) نێوان خۆشی دو یان چەندژن پێکەوە [ف] ۱) نسبت خواهری؛ ۲) نزدیکی و صمیمیّت چند زن باهم.

**خۆشکایی:** ئاسو دەیی، بێ خەمی [ف] آسودگی.

**خۆش کردن:** ۱) بەرزکـردنەوەی گڕی ئاگر؛ ۲) ئامادەکردنی پێست بۆ دەکار کردن؛ ۳) تام تاڵ شیرین کـردن؛ ۴) قـوڕشێلان بەسەر یەکـدا؛ ۵) وەستـانی بارشت؛ ۶) گوشـادو تازەکـردنـەوەی جێگـە؛ ۷) باش کێڵانی زەوی؛ ۸) تەخت کردنی شوێنی نالەبار؛ ۹) توندتر بوُنی با [ف] ۱) آتش را دامن‌زدن؛ ۲) پوست را قابل استفاده کردن؛ ۳) طعم تلخ را شیرین کردن؛ ۴) گِل را خوب سرشتن؛ ۵) بندآمدن باران یا برف؛ ۶) تعمیر و بەسازی مسکن؛ ۷) زمین را خوب شخم زدن؛ ۸) زمین را صاف کردن؛ ۹) تُند وزیدن باد.

**خۆش کردنەوە:** ۱) وێستانی بارشت؛ ۲) ئاشت کردنەوە [ف] ۱) بندآمدن بارندگی؛ ۲) آشتی کردن.

**خۆش کرن:** خۆش کردن [ف] نگا: خۆش کردن.

**خوشکۆك:** جوانکیلە، سپەهی، خوشیك [ف] زیبا.

**خوشکە:** ئەی خوشك، خوشکێ [ف] ای خواهر.

**خۆشکـە:** ۱) فەرمـان بەخـۆش کردن؛ ۲) پەلـەبکـە، بلەزە؛ ۳) نەتاڵ: (بنێشتە **خۆشکە**) [ف] ۱) امر به «خۆش» کردن؛ ۲) عَجَله کُن؛ ۳) دور از تلخی.

**خوشکەزا:** منداڵی خوشك، رۆڵەی خوشك [ف] خواهرزاده.

**خوشکەزازا:** نەوەی خوشك [ف] نوهٔ خواهر.

**خوشکەلێ:** خوشکە [ف] ای خواهر.

**خوشکێ:** خوشکە [ف] ای خواهر.

**خۆشکێش:** ۱) توتنی نە نەرم نە توند، ناونجی؛ ۲) ئەسپی راهێندراو [ف] ۱) توتون ملایم؛ ۲) اسب تربیت شده.

**خۆشکێن:** بێ فیز، خۆبەزل نەزان [ف] فروتن.

**خوشکێنی:** خوشکایەتی [ف] خواهری.

**خۆشکێنی:** خۆبەزل نەزانین، بێ فیزی [ف] تواضع.

**خۆش لێ هاتن:** خۆش ویستن ف دوستداشتن.

**خۆش مامڵه:** سەودا خۆش ف خوش مُعامله.

**خۆش مەزە:** بەلەزەت، خۆش چێژە ف خوشمزه.

**خۆشنان:** نان بدە، دڵاوا، سەغاوەت ف بخشنده، سخاوتمند.

**خۆشناو:** ١) عەشیرەتێکە لەکوردستانی باکوور. *ناوی «حەسنوبیە» بووە بۆتە «خۆشناو»* ؛ ٢) ناو بەچاکە دەرچووگ؛ ٣) جۆرێ ترێ رەشە ف ١) عشیرتی در کُردستان؛ ٢) خوشنام؛ ٣) نوعی انگور سیاه.

**خۆشناوەتی:** وڵاتی خۆشناوان ف منطقه‌ای در کردستان.

**خۆش نشین:** ئەو رەعیەتەی دەتوانێ لەدێ بارکا: (دڵم هەروەك رەعییەت خۆش نشینی موڵکی ئەعزاتە / لەهەرکوێ دادەنیشێ لێ گەڕێ، قوربانی باڵاتم) «حەریق» ف خوش نشین.

**خۆش وبێش:** چاك و خۆشی، چاك وچۆنی ف احوالپرسی.

**خۆش وچۆنی:** چاك وچۆنی ف احوالپرسی.

**خوشۆك:** جوان، رند، خوشیك ف زیبا.

**خۆش ویستن:** حەباندن، بەردڵ کەوتن ف دوستداشتن.

**خۆش هاتن:** بەخێرهێنان، خۆشاتن ف خوشامدگوئی.

**خوشە:** خوش خوش. *وەك دەنگی دۆشێنی شیر* ف شُرشُر.

**خۆشـە:** ١) بەلـەزەتە؛ ٢) پێستەخۆشە، دەنکی شیـرینی شەلاّنی و... ٣) چەرمی خۆشکـراو؛ ٤) دەرمـانی چەرم خۆشکـردن، هەلاّڵ وتاڵ؛ ٥) گوڵی دەخـل ف ١) خوشمـزە است؛ ٢) هستهٔ شیرین؛ ٣) چرم دبّاغی شده؛ ٤) داروی دباغی؛ ٥) سنبلهٔ گندم و جو.

**خۆشەتاڵە:** کاهوی دەشتەکی ف کاهوی بیابانی.

**خۆشەجان:** نۆشی گیان ف نوش جان.

**خـۆشەچـن:** گـوڵ چنـەوە لە پەرێـز، کەسـێ کە دەسك وگوڵ دەکا ف خوشەچین.

**خۆشەچین:** گوڵ هەڵگرەوە، خۆشەچن ف خوشەچین.

**خۆشەخانە:** خۆشگە، دەباغ خانە ف کارگاه دبّاغی.

**خۆشەوبوون:** چابوونەوە لە نەخۆشی، هەستانەوە ف شفایافتن.

**خۆشەوکردن:** ١) چاکردنەوەی نەخۆش یان برین؛ ٢) تۆڵەو قەرەبوی خراپ کردن ف ١) شفا بخشیدن؛ ٢) قصاص کردن.

**خۆشەوە کردن:** خۆشەو کردن ف نگا: خۆشەوکردن.

**خۆشـەوی:** ١) لەبـەردڵان؛ ٢) ناوە بۆ پیاوان ف ١) محبوب؛ ٢) نامی برای مردان.

**خۆشەویس:** خۆشەویست، لەبەردڵان ف محبوب.

**خۆشەویست:** خۆشەویس ف محبوب.

**خـۆشەویسـتی:** ١) محیـبـبـەت؛ ٢) دڵـداری، ئەڤینـی ف ١) مَحبت؛ ٢) دلدادگی.

**خۆشەویسی:** خۆشەویستی ف نگا: خۆشەویستی.

**خـۆشـی:** ١) ئاسـودەیی، رەحەتی؛ ٢) شادی بەدەماخی، تەڕدەماخی؛ ٣) بەلەزەتی؛ ٤) ساقی، سلامەتی؛ ٥) ئاشتی، تەبایی؛ ٦) دنیای بێ بارشت و بێ سەرمـا ف ١) آسایش؛ ٢) شادی؛ ٣) خوش‌مزگی؛ ٤) سلامت؛ ٥) آشتی؛ ٦) دنیای بدون بارش و سرما.

**خۆشیان:** ١) راکشـانی ئەستێرە؛ ٢) رێکـردنی خەزنـە ف ١) جهیدن شهاب؛ ٢) خزیدن.

**خۆشیان:** ١) رۆژانی بێ بارشت لە زستـاندا؛ ٢) ئەوانیش بۆخۆیان ف ١) اوقات بی بارندگی در زمستان؛ ٢) خودشان نیز.

**خۆشی خۆشی:** ١) هومێدی بەهێز؛ ٢) کەیف و شادی ف ١) اُمیدواری؛ ٢) شادی و سرور.

**خۆشـیـرن کردن:** خۆ خۆشـەویسـت کردن، کاری واکـردن کە خۆشەویست بیت ف خودشیرینی.

**خۆشیرین کردن:** خۆ شیرن کردن ف خود شیرینی.

**خوشیك:** سپـەهی، جوان و دڵگـر، دەلال: (دوخـوشکی **خوشیك** و یەك برابون) «مەم وزین» ف زیبا.

**خوشیل:** ١) خوژیلك؛ ٢) خزگەی ماسی؛ ٣) رنـوُی هەرەس هێنـاو، کڵێڵەی پساو ف ١) گیاهی است؛ ٢) پناهگاه ماهیان؛ ٣) بهمن فرو ریخته.

**خوشیلك:** خوژیلك ف گیاهی است.

**خوشیلکە:** خوشیلك ف گیاهی است.

**خوشین:** خوشیان ف نگا: خوشیان.

**خوشینك:** خوشیك ف زیبا و جذاب.

**خۆشی وبۆشی:** خۆش وبێش ف احوالپرسی.

**خۆف:** ترس ف تَرس.

**خوُك:** پیتاکی میری، باج، ماڵیات ف باج وخراج.

**خۆکار:** ئامرازێ کە سەربەخۆ کاردەکاو کاری دەست ئەنجام دەدا ف خودکار.

**خۆکـــرد:** ١) خۆرسـك؛ ٢) کارێ کەپیاو خۆی دەیکـا ف ١) طبیعی، غیرمصنوعی؛ ٢) کار انحصاری شخص.

**خۆکوشتن:** ١) خۆ لەناوبردن بە مردن؛ ٢) برێتی لە، لە سەرو سنگ دان لە شیوەندا ف ١) خودکُشی، انتحار؛ ٢) سینه‌زنی در مراسم عزا.

**خۆکەرکردن:** ١) خۆ بەنەزان نیشان‌دان؛ ٢) کێشەبە خەڵك فرۆشتن ف ١) خود را به نادانی زدن؛ ٢) بی‌دلیل دعوا کردن.

**خۆ کەڕ کردن:** بەئانقەست گوێ نەدان بە فەرمان ف خود را به کری زدن.

**خۆکێشان:** خۆ هەڵسەنگاندن لە تەرازودا ف خود را وزن کردن.

**خۆکێشـانـەوە:** ١) لە هاوکـاری کۆمەڵ دەرچون؛ ٢) برێتی لەمردنی پیاوخراپ ف ١) دست از کار گروهی کشیدن؛ ٢) کنایه از مرگ بدسگال.

**خۆکێش کردن:** خۆڕەکێش کردن ف با دشواری رفتن.

**خوُگ:** بەراز، وەراز، گاکوڵ ف خوك.

**خوُگـانـە:** ١) وەك بەراز؛ ٢) بابەتی بەراز: (پیازە **خوُگانە**) ف ١) مانند خوك؛ ٢) شایستهٔ خوك.

**خۆگر:** کەسێ کاری خۆگرتنە ف کسی که کارش «خوگرتن» باشد.

**خۆگـرتن:** ١) سەبـرکردن؛ ٢) وێستان و چەقین؛ ٣) بەئاوات گەیشتن؛ ٤) وێستان بۆ گوێ گرتن لە خەڵك؛ ٥) تەمەڵی لە کار؛ ٦) مەیین ف

۱) صبـر کردن؛ ۲) استـوارشدن؛ ۳) کامگارشُدن؛ ۴) استراق‌سمع کردن؛ ۵) در کار اهمال ورزیدن؛ ۶) بندآمدن مایع.

**خۆگـرتن:** ۱) فێری نەریت‌بوُن؛ ۲) هۆگر بوُن: (گا دەپاڵ گادا رەنگی نەگریَ خوُی دەگریَ) ف ۱) عادت کردن؛ ۲) الفت گرفتن.

**خۆگرتو:** ۱) خۆدار؛ ۲) چەقیو؛ ۳) بەئاوات گەیشتو؛ ۴) مەیو؛ ۵) گویگر لەقسـەی خەڵـك بەنهێنی ف ۱) خوددار؛ ۲) استـوار؛ ۳) کامگـار؛ ۴) بندآمده؛ ۵) استراق‌سمع کننده.

**خۆگرتو:** ۱) فێر بوی رەوشتێك؛ ۲) هۆگر ف ۱) خُلق و خویی را آموخته؛ ۲) اُلفت گرفته.

**خۆگرتی:** خۆگرتو ف نگا: خۆگرتو.

**خۆگرتی:** خۆگرتو ف نگا: خۆگرتو.

**خۆگڤاشتن:** خۆگوشین، رژدبون، برێتی لە رەزیلی کردن ف کنایه از خساست.

**خۆ گورج کردن:** خۆ پەیت کردن، خۆ ئامـادەکردن بۆ کار ف خود را آماده کردن.

**خۆ گورج کردنـەوە:** ۱) جلکی دەرەوە دەبـەرکردن؛ ۲) وەکار کەوتن دوای تەمـەڵی ف ۱) لبـاس بیرون خانـه پوشیدن؛ ۲) دوباره دست به‌کار شدن.

**خۆ گۆڕین:** ۱) جلکی‌تر دەبـەرکـردن؛ ۲) بەجـۆریَ‌تر نەك وەك هەیە خۆنیشاندان ف ۱) لباس عوض کردن؛ ۲) تلبیس.

**خۆگەڕ:** بروانە خۆکار ف نگا: خۆکار.

**خۆگەملە:** ۱) گوریس کێشکێ؛ ۲) مل‌قەوی، مل‌ستور ف ۱) مسابقهٔ طناب‌کشی؛ ۲) گردن کُلفت.

**خۆگی:** خۆك، باج و پیتاکی میری ف باج و خراج.

**خۆگیر:** خۆگر ف نگا: خۆگر.

**خۆگیڤ کردن:** خۆبەجوانی نیشان‌دان ف خود را آراستن.

**خۆگـێل کردن:** ۱) لەقـەستی خۆ بەنـەزان شان‌دان؛ ۲) پاش‌گویَ خستنی‌کار ف ۱) تجاهُل؛ ۲) اهمال.

**خول:** ۱) سوڕ، زڤـرین؛ ۲) گەڕان؛ ۳) مل‌خوار لە نەخـۆشی؛ ۴) وەك شێت، شێتوکە ف ۱) چرخش؛ ۲) گردش؛ ۳) زرد و ضعیف از شدّت بیماری؛ ۴) خُل.

**خۆل:** حوَل، گێژوگێل ف هالو.

**خۆڵ:** ۱) ئاخ، خاك، گڵ؛ ۲) لەدوای وشـەی «خـەست» بەمـانـای «تـونـدوخـۆش»: (مـاستـاوێکی خەست‌و خۆڵم کرد)؛ ۳) پتـەوی تێرگۆشت: (جوانێکی خڕو خۆڵە) ف ۱) خاك؛ ۲) غلیظ؛ ۳) چاق و چلّه.

**خوُل:** ۱) پشت چەماو؛ ۲) مل خوار ف ۱) کوژ پشت؛ ۲) سر بزیر.

**خولاّ:** خوا، خودا، خودیَ، بیناهیا چاڤا ف خُدا.

**خولاسە:** پوختە، پوختەی وتار ف خُلاصه.

**خولام:** نۆکەر، بەنی ف غُلام.

**خولاّم:** ۱) خولام؛ ۲) خودای من ف ۱) غُلام؛ ۲) خُدای من.

**خولاّمانە:** کاکۆڵ لە تەپڵەسەری لاوان ف کاکُلِ جوانان.

**خولامەتی:** نۆکەری، خزمەتکاری ف غُلامی.

**خولاّمەتی:** خولامەتی ف نگا: خولامەتی.

**خولان:** سوُڕان ف چرخش.

**خولاندنەوە:** ۱) سوُڕاندن، زڤراندن؛ ۲) برێتی لە سەرلیَ شێواندن ف ۱) چرخانیدن؛ ۲) کنایه از سرگردان کردن.

**خولانەوە:** ۱) سوُڕان، چەرخان؛ ۲) بەخۆڕایی گەڕان ف ۱) چرخیدن؛ ۲) بی‌هدف گشتن.

**خولاّو:** ۱) خۆڵـەمێشـاو بۆ صابـون چێ‌کردن؛ ۲) ئاووخـۆڵی مێوژ تیَ‌هەڵکێشان ف ۱) تیزاب صابون‌سازی؛ ۲) گِلاب مویزسازی.

**خولتە:** ماستاوکردن، کلکەسوتە ف تملُّق.

**خول خواردن:** سوڕدان، زڤرین ف چرخش.

**خولخول:** دەنگی ڕوێشتنی ئاو، خوڕخوڕی ئاو ف شُرشُر آب.

**خولخولۆکە:** دارێکی لەخەرت دراوی نۆکداری بەکلکە دەیسوُڕێننەوە ف گردنای کودکان.

**خولخولە:** خولخولۆکە ف گردنا.

**خولخـۆڵـە:** دەسکەگۆزەی شکاو کە منالّ گەمەی پیَ‌دەکەن، سەبیلەی شەیتان ف دستهٔ شکستهٔ سبو.

**خوڵخوڵە:** هەراو چەقە، زەنازەنا ف همهمه، هیاهو.

**خوڵق:** ۱) خوُ، ئاکار: (پیاوێکی **خوڵق** خۆشە)؛ ۲) گازی بۆ بەشداربوُن: (خـوڵقی کردم بچمـەماڵ، نانی دەگەڵ بخۆم) ف ۱) خوی و روش؛ ۲) دعوت.

**خوڵقان:** دروست بوُن ف آفریده شُدن.

**خوڵقاو:** چیَ‌بو، دروست‌کراو ف آفریده شده، مخلوق.

**خوڵك:** خوڵق ف نگا: خوڵق.

**خولکە:** دەقیقە، پاژێك لە شێست پاژی سەعات ف دقیقه.

**خۆڵماڵ:** مشت‌وماڵی شیر و خەنجەر ف صیقل شمشیر و مانند آن.

**خوڵوُ:** ۱) خولخولە؛ ۲) خوڵخوڵە ف ۱) گردنا؛ ۲) همهمه.

**خوڵوپ:** گەوز، بەڕاکشاوی ئەم‌دیو ئەودیوکردن ف غَلْت.

**خوڵوپان:** گەوزین ف غَلْتیدن.

**خوڵوپاندن:** گەوزاندن ف غَلْتاندن.

**خوڵوپانن:** خوڵوپاندن ف غَلْتاندن.

**خوڵوپیان:** خوڵوپان ف غَلْتیدن.

**خوڵوپیانەوە:** خوڵوپیان ف غلتیدن.

**خولوّر:** خلوّر ف غلتان.

**خۆڵوشیر:** گیایەکە تۆمەکەی دەخوریَ ف خاکشیر.

**خولوّلیك:** وردە تەرزە، تەرزەی ورد، تەیرۆکی هوُر ف تگرگ ریز.

**خولە:** سوکەڵەناوی مەحموُد ف مُخفَّفِ محمود.

**خۆڵەپۆت:** جێگەی پڕ لە خاکی زۆر نەرم‌و ورد ف کَلجان.

**خۆڵەپۆتە:** خۆڵەپۆت ف کلجان.

**خۆڵەپۆتیَ:** خۆڵەپۆت ف کَلجان.

**خۆڵەپۆتین:** خۆڵەپۆت ف کلجان.

**خۆڵەپۆتینە:** خۆڵەپۆت ف کَلجان.

**خۆڵەپەتانێ:** گەمە بەخۆڵ کردن، یاری‌کردن بەخاك ف خاك‌بازی.

**خۆڵـەژان:** نەخـۆشین بەهۆی گڵ‌خواردنەوە ف عارضه‌ای که از خاك خوردن پدید می‌آید.

**خۆڵەکەوان:** شوێنی زبڵ‌وزاڵ لێ‌ڕشتن ف کلجان.

**خۆڵەکەوە:** خۆڵەمیش، خۆ لی، بۆڵ، سوتاوی سپی هەڵگەڕاوی‌دار ف خاکستر.

**خۆڵەگەزدان:** ڕاست ڕاکشان، گنج‌لەخۆ بڕین، بێ گرێ خۆ ڕاکێشان ف درازکشیدن.

**خۆڵەمڕ:** خۆڵەکەوە؛ ٢) خۆڵەپۆت ف ١) خاکستر؛ ٢) تودهٔ گردو خاك.

**خۆڵەمڕە:** خۆڵەمڕ ف نگا: خۆڵەمڕ.

**خۆڵەمشکی:** خۆڵەکەوە ف خاکستر.

**خۆڵەمێش:** خۆڵەکەوە ف خاکستر.

**خۆڵی:** خۆڵەکەوە ف خاکستر.

**خولیا:** کەلکەلە، خەیاڵ‌و ئارەزو، هەوەس ف آمال و آرزو.

**خولیان:** خەیالات، ئاواتی پڕو پوچ ف آرزوهای مهمل.

**خولیانەوە:** خولانەوە ف چرخیدن.

**خۆڵی پفك:** ژیلەمۆ، ژیلە، خۆڵەکەوەی گەرم‌و ئاگراوی ف خاکستر گرم.

**خۆڵی دان:** ژێر جگەرە، تەپلەك ف زیرسیگاری.

**خولیسك:** خلیسك ف لیز.

**خۆڵی سەر:** کڵۆل، بیچارە ف بیچاره.

**خوم:** ١) خم، هەش: ٢) کوپە ف ١) نیل؛ ٢) خُم.

**خۆم:** بۆخوم، من ف خودم.

**خومار:** کەسێ کە دوای سەرخۆشی سەری دێشێ ف خُمار.

**خوماری:** سەرێشەی دوای سەرخۆشی ف خُماری.

**خومارین:** کزو خەفە بوُنی ئاگر کە نزیکە بکوژێتەوە ف آتش در حالتی که نزدیك به خاموش شدن است.

**خـۆمـالـی:** ١) تایبەتی بەماڵی خۆ؛ ٢) ماڵی، حەیوانی لە ماڵا زاو ف ١) اختصاصی؛ ٢) حیوان خانگی.

**خومالیك:** کوپە ف خُم.

**خومام:** ١) تەپ‌و مژ؛ ٢) لەش پۆش لەکاتی ڕازاندا؛ ٣) تخێل ف ١) مه؛ ٢) روانداز؛ ٣) کاملاً دراز کشیده.

**خۆمان:** ئێمە، خەڵك‌نا ف خودمان.

**خۆمانە:** تایبەتی بەخۆمان ف خودمانی.

**خۆمانەخۆمانە:** کەین‌وبەین، پێك‌هاتنی بەنهێنی لەسەر کارێك ف تبانی.

**خۆمانی:** لەخۆمان، دژی بێگانە ف خودمانی.

**خۆمت کردن:** خۆ بێدنگ کردن‌و مات‌بوُن ف ساکت و بی حرکت شدن.

**خومچی:** ڕەنگ ڕێژ، خمگەر ف رنگرز.

**خومخانە:** خمخانە ف رنگرزی.

**خومخانەچی:** خمگەر ف رنگرز.

**خومخۆرك:** قەڵەشتی عەرز ف شکاف زمین.

**خومخوم:** ١) شەنگ‌و شۆخ؛ ٢) دەنگی ئاو کە بە روبارو جوگەدا دەڕوا؛ ٣) گرمەی هەور ف ١) زیبا و فریبا؛ ٢) صدای آب هنگام حرکت در جوب؛ ٣) غرش ابر.

**خومری:** سوُری ئاماڵ ڕەش، خورمایی ف خُرمایی‌رنگ.

**خومشێوان:** خم‌شێوان ف کنایه از آشوب و بلوا.

**خومشێوێن:** خم‌شێوێن ف کنایه از آشوبگر.

**خومگەر:** خمگەر ف رنگرز.

**خوممین:** دەربەدەر بوُن، ئاوارەبوُن ف آواره شُدن.

**خومەڕژە:** کاسەڵە شینکە، کەندەسمە، مەلێکە تەواو سەوز ف پرندهٔ سبزقبا.

**خومەرەژە:** خومەڕژە ف سبزقبا.

**خومەرێژە:** خومەڕژە ف پرندهٔ سبزقبا.

**خۆمەش:** خۆگەڕ، خۆکار ف خودکار، اتوماتیك.

**خومەشوێنکە:** خم‌شێوێن ف آشوبگر.

**خومەشوێنە:** خم‌شێوێن ف آشوبگر.

**خومەشێونە:** خم‌شێوێن ف آشوبگر.

**خومی:** خمی ف نیلی‌رنگ.

**خومیا:** بە سەریەکدا کۆم بوُگ ف برهم انباشته.

**خومین:** خمی ف نیلی‌رنگ.

**خۆمین:** کۆما کردن، بەسەریەکدا کردن ف انباشته کردن.

**خۆن:** خۆمان ف خودمان.

**خوُن:** خوێن، هوُن، خین ف خون.

**خـۆنـاس:** ١) کەسـێ کە قەدری‌خۆی دەزانـێ؛ ٢) ناسیاو، ئاشنـا ف ١) خودشناس؛ ٢) آشنا، دوست.

**خۆنـاسین:** ١) دەخـۆ گەیشتن؛ ٢) باڵق‌بوُن، بلوغ‌بوُن، «شـەیتـان پێکـەنین». *تایبـەتی کچـانە* ف ١) خود را شناختن؛ ٢) بالغ شدن، بەسن بلوغ رسیدن.

**خوناف:** ١) شەونم؛ ٢) پریشکەبارانی زۆر وردو لەسەرەخۆ ف ١) شبنم؛ ٢) نم‌نم باران.

**خـونـاو:** ١) خونـاف؛ ٢) ئاوی شۆربـاو قاورمـە ف ١) نگا: خوناف؛ ٢) آب‌پز قورمه.

**خوناوکە:** ١) وردەبارانی هێدی‌و نەرم؛ ٢) ئاوی لەقوڵکەدا ماوی باران؛ ٣) بریتی لە دەنکـەدنکە ئارەقەی دەم‌وچـاو ف ١) نـم‌نـم بـاران؛ ٢) باران جمع‌شده در گودالها؛ ٣) کنایه از دانه‌های عرق صورت.

**خوُن بەردان:** خوێن بەردان، حەجامات ف رگ زدن.

**خوُن پەستی:** تەوژمی خوێن ف فشار خون.

**خونج:** جێ‌بوُنەوە، جێگە بۆ تێ‌خستنی شتێك ف گُنجایش.

**خونجان:** گونجان، جێ‌بوُنەوە ف گُنجایش.

**خونجانن:** جێگا تێدا کردنەوە ف گُنجانیدن.

**خونج‌گا:** شوێنی تێدا جێ‌بوُنەوە ف گُنجایش‌گاه.

**خونجیان:** خونجان ف گُنجایش.

**خونجیلانە:** خنجیلانە ف کوچولوی دوست‌داشتنی.

**خونجیلە:** خنجیلانە ف کوچولوی دوست‌داشتنی.

**خونچە:** پشکوُژ، گوڵی هێشتا نەپشکوتو ف غُنچه.

**خونچیلانه:** خنجیلانه ف کوچولوی دوست‌داشتنی.
**خونچیله:** خنجیلانه ف کوچولوی دوست‌داشتنی.
**خونخوار:** بریتی له زاڵم، بێ‌بەزە، دڵرەق ف کنایه از ظالم و خونخوار.
**خۆند:** خوێندی، خوەندی، خۆندی ف خواند.
**خۆنـدکـار:** ۱) ئەوی دەزانێ بخوێنێ‌و بنوسێ، خوێندەوار، سیوات‌دار، باسەواد؛ ۲) ئەوانەی لەپلەی باڵا لەزانستگا دەخوێنن ف ۱) باسواد؛ ۲) دانشجو.
**خۆندگا:** جێگە دەرس خوێندن، فێرگە ف آموزشگاه.
**خۆندن:** ۱) خوێندن؛ ۲) گۆرانی گوتن ف ۱) خواندن؛ ۲) آواز خواندن.
**خۆندنگا:** فێرگە، جێگەی دەرس خوێندن ف مدرسه.
**خۆنـدنـەوە:** ۱) خوێنـدنـەوەی نامەو نوسراو؛ ۲) دوبارە پێداچوُنەوەی نوسراو ف ۱) خواندن نوشته؛ ۲) دوباره خواندن نوشته.
**خۆندەوار:** سیوات‌دار، خۆندکار، خۆنەوار ف باسواد.
**خۆندەوان:** خۆندەوار، خۆنەوار ف باسواد.
**خۆندی:** خۆندەوار، دەرس خوێندو ف باسواد.
**خوُندی:** بوکنی، ئەوانەی دەچن بوُك دەگوێزنەوە بۆماڵ زاوا ف ساق دوش.
**خوُن دیتن:** ژن کەوتنە بێ‌نوێژی ف حیض.
**خوُن‌ژەهری:** خوێن ژەهراوی ف مسموم شدن خون.
**خونّقین:** بارینی نم‌نم‌و کەم‌کەم ف نم‌نم باریدن.
**خونْك:** ۱) هەرزەکارێ کە وازی لەدەست‌بازی‌و خۆ دە خەڵك هەڵسوُنە، جلف؛ ۲) پیاوی رەزیلی هەنگـوتك ژمێر ف ۱) هرزه، جلف، قرتی؛ ۲) خسیس.
**خونکار:** پاتشای گەورە ف فرمانروای بزرگ.
**خوُن گەرم:** بروانە خوێن گەرم ف نگا: خوێن گەرم.
**خۆنما:** ئەوکەسەی وا خۆنیشان دەدا کە لەخەڵك خۆی بەزل‌تر دەزانێ ف خودبین.
**خـۆنـمـایی:** ۱) خۆ بەغـلـوری نیشـانـدان؛ ۲) خۆ دیارخستن ف ۱) خودنمایی؛ ۲) خود را آشکار کردن.
**خۆنن:** ۱) دەرس خوێندن؛ ۲) گۆرانی گوتن، چرین؛ ۳) گوتنی بانگی نوێژ؛ ۴) گوتنی دوعـا؛ ۵) دەنگی مەل‌و باڵنـدە؛ ۶) لە دوای وشـە بەمانای «خۆمانن»: (ئەو مریشکانەی **خۆنن**) ف ۱) درس خواندن؛ ۲) آواز خواندن؛ ۳) اذان گفتن؛ ۴) دعا خواندن؛ ۵) نوای پرندگان؛ ۶) پسوند بەمعنی مال خودمان است.
**خۆنواندن:** خۆنمایی ف خودنمایی.
**خۆنوانن:** خۆنواندن ف خودنمایی.
**خـۆنـوس:** ۱) قەڵـەم پانـدان؛ ۲) قەڵـەم جـاف ف ۱) خودنـویس؛ ۲) خودکار.
**خۆنوێن:** خۆنما ف خودنما.
**خۆنوێنی:** خۆنمایی ف خودنمایی.
**خۆنە:** ۱) پنە، تەختەی پانی ئەنگوتك لەسەر پان کردنەوە؛ ۲) لەدوای وشە بەمـانـای «خـۆمانە»: (ئەوهە ماڵی **خۆنە**)؛ ۳) دیزە: (دەر**خۆنە**، واتا: دەرگای دیزە)؛ ۴) بێ‌خاوەن؛ ۵) پشیلەی نێر ف ۱) تختەای کە خمیر را روی آن پهن کنند؛ ۲) پسوند بەمعنی «خودمان است»؛ ۳) دیزی؛ ۴) بی‌صاحب؛ ۵) گربۀ نر.
**خوُنـە:** خۆیانی چەڵتوك، چەڵتوك کە هێشتا لە کا جیا نەبوُتەوە ف کستۀ شالی.
**خۆنـەگـر:** ۱) شل‌و ول؛ ۲) بێ‌سەبـر و حەوسەلە ف ۱) سُست، شُل؛ ۲) ناشکیبا.
**خۆنەوار:** خۆندەوار خۆنەوار ف باسواد.
**خونەواری:** خۆندەواربون ف سواد داشتن.
**خۆنیشاندان:** ۱) دیاردان، خویابون؛ ۲) دەرکەوتنی بە کۆمەڵ بۆ داوای کارێك لە میری ف ۱) خود را آشکار کردن؛ ۲) تظاهرات.
**خۆو:** ۱) خەون، ئەوشتانەی پیاو لەخەودا دەبینێ؛ ۲) خۆتان ف ۱) رؤیا؛ ۲) خودتان.
**خـۆوالـی:** ۱) خـەواڵـو، خـەواوی، بێـداری هێشتا چاوبەخەو ف خواب‌آلود.
**خۆوبەخت:** خوابەختەکی ف شانسی.
**خۆوەر:** خۆرسك، خۆرست ف خودرو، طبیعی.
**خۆوێژ:** شاعرێ کە بێ‌فکر کردنەوە شێعر دەڵێ ف شاعر ارتجالی.
**خـۆوێـڵ کـردن:** ۱) خۆ گێل کردن؛ ۲) بەئانقەست لـەرێ دەرچون ف ۱) تجاهُل کردن؛ ۲) عمداً مُنحرف شدن.
**خۆه :** ۱) خۆ، ئارەقـەی لەش؛ ۲) ئاونـگ، شەونم؛ ۳) خەنـدە، کەن، کەنین؛ ۴) خـوشك، خـویشك، خـوار ف ۱) عَرَق بدن؛ ۲) شبنم؛ ۳) خنده؛ ۴) خواهر.
**خۆهدان:** ۱) ئارەقەی لەش؛ ۲) ئارەق کردن ف ۱) عَرَق بدن؛ ۲) عَرَق کردن.
**خۆهر:** خوار، لار، چەوت، چەوێڵ، کەچ ف کج.
**خۆهرا:** خۆرا، زۆرخۆر، فرەخۆر ف پُرخور.
**خۆهری:** خواری، ناراستی ف کجی.
**خۆهزا:** خوارزا ف خواهرزاده.
**خوەزوُر:** خەزوُر ف پدر همسر.
**خۆهستن:** داواکردن، خواستن ف خواستن.
**خۆهستەگ:** خازۆك، خوازەلۆك ف گدای سِمج.
**خۆهستی:** داواکاری کیژ، خوازێنی کەر ف خواستگار.
**خۆەماڵ:** خاوەن‌ماڵ ف صاحب‌خانە.
**خوەنین:** حاشا کردن، نەچوُنە ژێر ف انکار کردن.
**خۆهەلاواردن:** خۆکێشانەوە لە هاوبەشی کارێك ف خود را کنار کشیدن.
**خۆهەڵبواردن:** دەبەش کردندا خۆ کەنارگرتن ف خود را بەحساب نیاوردن.
**خۆهەڵبەست:** بوختان‌و درۆ ف افترا.
**خۆهەڵتڕاندن:** خۆهەلکێشانی بەلاش، تڕوتۆپ کردن ف بلوف‌زدن.
**خۆهەڵخستن:** خۆ بەر بەرۆچکەدان، لەبەر هەتاو دانیشتن بۆ گەرم بوُنەوە ف حمّام آفتاب گرفتن.

**خۆهەڵخستنەوە:** باسی خۆکردن بەدرۆ ف لافزنی.
**خـۆهەڵـدان:** ١) خۆ هەڵخستنـەوە؛ ٢) خۆ حەوادان ف ١) لافزنی؛ ٢) ورجهیدن.
**خۆهەڵشرنگاندن:** خۆ هەڵخستنەوە ف لافزنی.
**خۆهەڵکردن:** لنگ هەڵکردن ف پاچەورمالیدن.
**خۆهەڵکێش:** کەسێ کە بەخۆی هەڵدەڵی ف خودستا.
**خۆهەڵکێشان:** مەحتی خۆکردن، بەخۆ هەڵگوتن ف خودستایی.
**خوەی:** خوێ، بنەمای سوێڵی ف نمك.
**خـوێ:** ١) بنـەمای سوێری؛ ٢) خـاوەن: (خانە**خـوێ**)؛ ٣) سەرپەرشت؛ ۴) خوشـك، خوەیشـك ف ١) نمـك؛ ٢) صاحب؛ ٣) سرپـرست؛ ۴) خواهر.
**خـۆی:** ١) تایبەتـی ئەو؛ ٢) ئارەقەی لەش؛ ٣) شـەونم ف ١) خودش؛ ٢) عَرَق بدن؛ ٣) شبنم.
**خُوی:** خوُ، ئاکار، رەوشت ف خوی و روش.
**خویا:** دیار، ئاشکرا، بەرچاو ف آشکار، پیدا.
**خویان:** خویا ف آشکار.
**خۆیان:** ١) تایبـەتـی ئەوان؛ ٢) کلۆشـی گێرەکـراوی خڕەوەبـوی شەن نەکراو ف ١) خودشان؛ ٢) کسته.
**خویانەك:** دیمەن، بەرچەوەن ف چشم انداز، منظر.
**خۆیانی:** ناسیاو، ئاشنا ف آشنا.
**خـۆیـایـەتی:** خزمایەتی، دۆستایەتی: (کۆیایەتی و **خـۆیـایـەتی**) ف خویشاوندی.
**خـۆیبـوُن:** ١) سەربەخۆ بـوُن، کار بەکەسێتر نەمان، سەربەستـی؛ ٢) ناوی حیـزبێـکی ئازادی خوازی تێکەڵ لەکوردو ئەرمەنی بـوە ف ١) استقلال؛ ٢) نام حزبی ائتلافی از کُرد و ارمنی بوده.
**خوێچەژ:** کەسێ چێشت دەچێژێ تابـزانێ خوێی تەواوە ف کسی که غذا را می‌چشد.
**خوێچەژی:** تام کردنی چێشت داخوا خوێی چۆنە ف چشیدنِ غذا.
**خوێچەشتن:** خوێچەژی ف چشیدنِ غذا.
**خوێچێژ:** خوێچەژ ف کسی که غذا را می‌چشد.
**خوێچێژتن:** خوێچەشتن ف چشیدنِ غذا.
**خوێچێژی:** خوێچەژی ف چشیدنِ غذا.
**خوێچێشتن:** خوێچەژی ف چشیدنِ غذا.
**خوێدار:** بەصاحب، بەداژدار ف دارای صاحب.
**خوێداری:** سەرپەرشتی، ئاگاداری ف سرپرستی، نگهداری.
**خوێدان:** ١) نمـەکدان، جێگەی خوێ لەسەر سفرە؛ ٢) خوێ بەئاژەڵ دان ف ١) نمکدان؛ ٢) نمك دادن به دام.
**خوێدانە:** تێری خوێ، دەفری گەورە بۆ خوێتێکردن ف ظرف بزرگ نمك.
**خوێرایی:** بەلاش، فیڕۆ، مفت ف مُفت، رایگان.
**خوُێرك:** مۆرکـە، مۆرانـە، جانەوەرێکی وردیلەیە جلکی خوری دەخوا، مۆرد ف حشرهٔ بید.

**خوێڕی:** خوڕی ف بیکاره.
**خوێڕێژ:** بەردەپـانی جێگەی خوێ بەئاژەڵدان ف تختەسنگی که بر آن برای دام نمك پاشند.
**خوێڕێژگە:** خوێڕێژ ف نگا: خوێڕێژ.
**خوێز:** زوقم، خوس، خوُسار ف پژ، سرماریزه.
**خوُیز:** خوێز ف پژ، سرماریزه.
**خوێس:** خوێز ف پژ، سرماریزه.
**خـوُیـس:** ١) خویز؛ ٢) نیـانـە ناو ئاو بۆ نەرم بوُنـەوە، خـوُسـان ف ١) سرماریزه؛ ٢) خیساندن.
**خوُیسار:** خوێز ف سرماریزه، پژ.
**خویسان:** خوُسان، نەرمبوُن بەهۆی ئاو ف خیسیدن.
**خویسك:** خویز، زوقم ف پژ، سرماریزه.
**خویسی:** نەرمی بەهۆی ئاو ف خیسیدن.
**خوێش:** خزم، کەس‌وکار، قەوم ف فامیل، خویش.
**خوێشایەتی:** خزمایەتی، کەسایەتی ف خویشاوندی.
**خوُیشك:** خوشك، خوار، خوەیشك ف خواهر.
**خوُیشکەزا:** فرزەندی خوشك، خوارزا، خوارزی ف خواهرزاده.
**خویشە:** شەقار شەقار بوُنی زەوی کێلگ ف درز بردن زمین زراعتی.
**خوێشی:** خوێشایەتی ف خویشاوندی.
**خوێك:** خوُك ف باج و خراج.
**خوێکراو:** خوازەدە، نمەك لێدراو ف نمك‌سود.
**خویگ:** خێو، خاوەن، خودان ف صاحب، خداوند.
**خوێل:** ١) خوُیل؛ ٢) خوار، لار ف ١) لوچ؛ ٢) کج.
**خوُیل:** کەسێ رەشکێنەی چەپ و چیرەو یەك بەدو دەبینێ، خێل ف لوچ.
**خوێلێن:** کانی خوێ، شوێنێ کە خوێی لێوە دێنن ف معدنِ نمك.
**خوێن:** ١) خوُن، هون؛ ٢) لەدوای وشە، بەمانای «کەسێ کە دەخوێنێ»: (دۆعاخوێن، رەش**خوێن** خوێندی) ف ١) خون؛ ٢) پسوند بەمعنی خواننده.
**خـویـن:** ١) خوێن؛ ٢) قەرەبوُ کە لەپیـاوکوژ دەسێـنرێ ف ١) خون؛ ٢) خونبها.
**خوێن ئەستێن:** تۆڵەستێن ف انتقام‌گیر.
**خوێناو:** ١) خوێنێ کە لە گەروُ دێت؛ ٢) خوێنی تێکەڵ بەئاو ف ١) خونی که از گلو آید؛ ٢) خونابه.
**خوێناولێن:** خەڵتانی خوێن ف خون‌آلود.
**خوێناوهەڵێنان:** خوێن‌رشانەوە ف خون قَی کردن.
**خوێناوی:** خوێناولێن ف خون‌آلود.
**خوێن بایی:** قەرەبوُی خوێنی مردوی کوژراو ف خونبها.
**خوێن برا:** دوکـەس خوێنی باسکی یەکتـر تێکـەڵ دەکـەن و دەبنە برای خوێنی ف دو نفر که با بریدن دست خود و گذاشتن زخمها بر روی هم پیمان برادری می‌بندند.
**خوێن بژاردن:** خوێن بایی‌دان ف خونبها دادن.
**خوێن بەر:** دەماری خوێن‌راگوێز لە لەشدا ف شریان.

**خوێن بەربوُن:** خوێن لە کەپوّ هاتن، خوُن لیێڤل هاتن ف خون دماغ شدن.

**خوێن بەربەست کردن:** داکوژاندنی دوژمنایەتی ف پایان دادن به دشمنی.

**خوێن بەردان:** حەجامەت، خوێنی بن زمان بەردان ف رگ زنی، حجامت.

**خوێن بەس:** مەسلەت کردن، داکوژاندنی دوژمنایەتی ف آتش بس.

**خوێن بەست:** ۱) خوێن بەس؛ ۲) وێستانی خوێن لە ئەندام ف ۱) آتش بس؛ ۲) خون بندآمدن.

**خوێن تاڵ:** رەزاگران، زەرەگران، ئێسك قورس ف گرانجان.

**خوێن جمان:** ۱) تەوژمی خوێن؛ ۲) بریێتی لە توُڕەبوُن؛ ۳) هەرەتی بەهار ف ۱) فشار خون؛ ۲) کنایه از خشمگین شدن؛ ۳) موسم بهار.

**خوێن جومان:** بریێتی لە هەرەتی بەهار کە خوێن تازە دەبێتەوە ف کنایه از عنفوان بهار.

**خوێنخوا:** داواکاری تۆڵەی کوژراو ف خونخواه.

**خوێنخوار:** ۱) دوژمنی خوێنی؛ ۲) زاڵم ف ۱) دشمن خونی؛ ۲) ستمگر.

**خوێنخواری:** ۱) دوژمنایەتی توّخ؛ ۲) زاڵمی ف ۱) دشمنی خونی؛ ۲) ستمگری.

**خوێنخوّر:** زاڵم، پیاوکوژ ف خونخوار.

**خوێن داکوژاندن:** خوێن بەست ف آتش بس.

**خوێندگە:** فێرگە، مەکتەب، مەدرەسە ف آموزشگاه.

**خوێندن:** خوّندن ف خواندن.

**خوێندنگە:** خوێندگە ف آموزشگاه.

**خوێندنەوە:** خوّندنەوە ف خواندن نوشته.

**خوێندە:** سیوات دار، خوّندە ف باسواد.

**خوُێندەڤان:** خوّندەڤان، خوّندەوار ف باسواد.

**خوێن دەڵێن:** خوێن دادەر، ئەوەی خوێنی لەبەر بڕوا ف خون چکان.

**خوێندەوار:** خوّنەوار، خوێندەڤان ف باسواد.

**خوێندەواری:** سیوات داری، خوّنەواری ف باسوادی.

**خوێن ڕژ:** پیاوکوژ، قاتل ف آدم کُش.

**خوێن ڕژان:** بریێتی لەشەڕ کە پیاوی تیا بکوژرێ ف کنایه از جنگ و خونریزی.

**خوێن ڕژاندن:** بریێتی لە پیاوکوشتن ف کنایه از آدم کُشی.

**خوێن ڕژانن:** خوێن ڕژاندن ف کنایه از آدم کُشی.

**خوێن ڕژتن:** خوێن ڕژانن ف کنایه از آدم کُشی.

**خوێن ڕێژی:** پیاوکوژی ف خونریزی.

**خوێن سارد:** بریێتی لە پیاوی لەسەرخوّ، هێدی، بەحەوسەڵە ف خونسرد.

**خوێن ساردی:** پشودرێژی، سەبر و حەوسەڵە ف خونسردی.

**خوێن شیرن:** ڕەزاسوُك، ئێسك سوُك ف سبکروح، دوست داشتنی.

**خوێن شیرین:** خوێن شیرن ف سبکروح، دوست داشتنی.

**خوێنکردن:** مروّکوشتن ف آدم کُشی.

**خوێن کردنە کاسەوە:** بریێتی لە جزیادان و زوّر بوّهێنان ف کنایه از اذیّت و آزار کسی.

**خوێن کوژاندنەوە:** خوین داکوژاندن ف آشتی دادن دشمنان خونی.

**خوێن کوژانەوە:** خوێن بەست ف آشتی دادن دشمنان خونی.

**خوێنکەر:** پیاوکوژ، مێرکوژ ف قاتل.

**خوێنگر:** خزمی نزیکی کوژراو ف اقوام درجه اوّل مقتول.

**خوێن گرتن:** ۱) خوێن بەردان، حەجامەت؛ ۲) تێك چون و شێوان بەدیتنی کوژراو ف ۱) رگ زدن، حجامت گرفتن؛ ۲) دگرگونی حال از مشاهدهٔ مقتول.

**خوێن گرتو:** شێویا لە دیتنی خوین ف دگرگونی حال از مُشاهدهٔ خون.

**خوێنگەر:** ئەوی خوێنێ بەردەدا ف خونگیر.

**خوێن گەرم:** ۱) کەسێ کە زو هەڵ دەچێ، زو توُڕە دەبێ؛ ۲) سور لەسەر مەبەست ف ۱) زودرنج؛ ۲) اهل اصرار در کار.

**خوێن گەرمی:** ۱) زوُ هەڵچون؛ ۲) سوربوُن لەسەر ئەنجامی کارو مەبەست ف ۱) زودرنجی؛ ۲) اصرار و لجاج در کار.

**خوێنگیر:** ۱) خواگیری کوشتنی ناڕەوا؛ ۲) شێو یاگ لە دیتنی خوێن ف ۱) دچار مُصیبت شدن از قتل ناروا؛ ۲) دگرگونی حال از دیدن خون.

**خوێن لێ هاتن:** دەخوین هاتن ف خونالود شدن.

**خوێن مژ:** خوێن خوّر ف خونخوار.

**خوێنە:** خوێندن ف خواندن.

**خوێنەخوّ:** کەسێ کە داوای توّڵەی کوژراو دەکا ف خونخواه.

**خوێنەخوار:** دوژمنی خوێنی ف دشمن خونی.

**خوێنەخوارە:** خوێنەخوار ف دشمن خونی.

**خوێنەخوێ:** خوێنەخوار ف دشمن خونی.

**خوێنەدوبراکە:** دارێکە بەرە کەی سورە، بوّ ڕەنگ دەبێ ف درختی است که ثمرش قرمز است و مصرف رنگرزی دارد.

**خوُێنەر:** خوێنەخوێ ف دشمن خونی.

**خوێنەوار:** خوێندەوار ف باسواد.

**خوێن هەڵاوردنەوە:** ۱) بریێتی لە زوّر قەڵس بوُن؛ ۲) خوین ڕشانەوە ف ۱) کنایه از بسیار ناراحت شدن؛ ۲) خون بالا آوردن.

**خوێن هەڵێنان:** خوێن ڕشانەوە ف خون برآوردن.

**خوین هەڵێنانەوە:** خوێن ڕشانەوە ف خون برآوردن.

**خوُینی:** پیاو کوژ ف قاتل.

**خوێواوك:** خوێ لەئاودا تاویاوە، ئاوخوا ف آب نمك.

**خویە:** خوشك، خویشك ف خواهر.

**خوّیەتی:** خزمایەتی، دوّسایەتی ف خویشاوندی.

**خوێهدان:** خوّهدان ف عَرَق بدن.

**خوّیی:** خوّیایەتی ف خودی.

**خە:** ۱) خوشك، خوار؛ ۲) لەپاش وشە بە مانای: کەوتن: (بی خە، مەی خە)؛ ۳) پێوە هەڵواسین؛ ۴) خوّ ف ۱) خواهر؛ ۲) پسوند به معنی انداز؛ ۳) فعل امر از مصدر بستن؛ ۴) خود.

**خەبات:** کار، کوّششت ف کوشش، جهد.

**خەباتکار:** ۱) کارکەر؛ ۲) بەکوّششت ف ۱) مبارز؛ ۲) کارگر.

**خەبار:** بڤە، خەتەر ف خطر.

**خەبتان:** خەبات کردن، کارکردن، تێکۆشان [ف] کارکردن، کوشیدن.

**خەبتین:** خەبتان [ف] کوشیدن، کارکردن.

**خەبس:** ۱) ڕەنج و چەوسانەوە؛ ۲) دەسرەنج [ف] ۱) رنج؛ ۲) دسترنج.

**خەبسین:** پەشێو بوُن، سەر لێ تێك چوُن، شێویان [ف] هول شُدن.

**خەبەر:** ۱) وڵام، دەنگو باس؛ ۲) جنێو، سخێف؛ ۳) گفت، قسیە؛ ۴) ئاگا: (وەخەبەر هات، بەخەبەرە) [ف] ۱) خبر؛ ۲) دشنام؛ ۳) سخن؛ ۴) آگاهی.

**خەبەرات:** دەنگو باس، باسوخەبەر [ف] اخبار.

**خەبەر بوُنەوە:** لەخەو هەستان، بێدار بوُنەوە [ف] از خواب بیدار شُدن.

**خەبەر بەر:** وڵام‌بەر [ف] پیك.

**خەبەر بەزێن:** شوُفار، زوانگیر، جاسوس، سیخوڕ [ف] جاسوس.

**خەبەرپێ‌دان:** ئاگادار کردن [ف] آگاه کردن.

**خەبەردار:** ۱) بەئاگا، های لێ؛ ۲) وشەی حەنباڵان واتا: لادەن [ف] ۱) مُطلّع، آگاه؛ ۲) بپا، مواظب باش.

**خەبەردان:** ئاشکراکردنی وشەی نهێنی، ئیخباریە کردن [ف] گزارش دادن.

**خەبەردۆخ:** قسەکەر لەجیاتی کەسانی‌تر [ف] سخنگوی رسمی.

**خەبەر گوهێز:** قسە ڕاگوێز [ف] سخن چین.

**خەبەرۆشك:** نەزیلە، چیرۆك [ف] داستان.

**خەبەرهێن:** کەسێك وڵامێك دەهێنێ [ف] پیام‌آور.

**خەبەنگ:** سەربانی لەروکێش و تەنەکە [ف] بام شیروانی.

**خەبینەت:** مخابن، حەیف، بەداخەوە، داخەکەم [ف] دریغ.

**خەپ:** ۱) حەپ، قوُت‌دان لەزمانی منداڵان‌دا؛ ۲) دوای وشەی «خڕ» بەمانای: هەراش و قەڵەو [ف] ۱) خوردن در زبان بچّەها؛ ۲) پسوند بەمعنی رشید و بالندە.

**خەپار:** ۱) خۆش بوُنی کێڵگە بۆ چاندن؛ ۲) بژار [ف] ۱) آمادە شدن زمین برای کشت؛ ۲) وجین.

**خەپر:** وەرد، دوبارە کێڵان [ف] شُخم دوبارە.

**خەپراندن:** وەرد دانەوە [ف] دوبارە شخم‌زدن.

**خەپرە:** ۱) پاپۆکە، لێك هاڵانی بەئاڵقە؛ ۲) سەر نانەناو دەست و نوستن [ف] ۱) چنبرە؛ ۲) سر میان دست گذاشتن و خوابیدن.

**خەپشە:** شەرمی ژن، کوز [ف] شرمگاە زن.

**خەپك:** ۱) تەڵە؛ ۲) کولێرەی هەرزن [ف] ۱) تله؛ ۲) گردهٔ ارزن.

**خەپکە:** ئالقە، گەو [ف] حلقە.

**خەپلە:** ۱) گێلۆکەی نازیرك؛ ۲) کولێرەی ئەستور؛ ۳) کولێرە لە هەرزن؛ ۴) کورتەباڵای قەڵەو؛ ۵) خەپشە [ف] ۱) کودن؛ ۲) گردهٔ پهن و کُلفت؛ ۳) گردهٔ ارزن؛ ۴) چاقالو؛ ۵) شرمگاە زن.

**خەپوُڵی:** پوڵ پەرەست، پارەخۆشەویست [ف] پول‌پرست.

**خەپە:** ۱) درمغ، دارێکی بەددانە. کلۆشی پی کۆ دەکەنەوە؛ ۲) هەیە، شانەی تەون‌کوتان [ف] ۱) از ابزار کشاورزی؛ ۲) شانهٔ قالی‌بافی.

**خەپەتۆڵە:** منال یان بێچوە ئاژەلی خرپنەو قەڵەو [ف] بچهٔ چاق و گوشتالو.

**خەپەخەپ:** تلاوتل ڕۆیشتنی منداڵ [ف] تلوخوردن بچە.

**خەپەرە:** ۱) خرپن؛ ۲) خڕ بوُنەوەی سەگ و پشیلە لە خەودا [ف] ۱) بچهٔ چاقالو؛ ۲) جمع‌شدن دست و پای حیوان وقت خواب.

**خەپەرە کردن:** خۆلێك هاڵاندنی سەگ و پشیلە لەخەودا [ف] جمع شدن بدن حیوان موقع خواب.

**خەپەڵە:** خرپنە، خەپەتۆڵە [ف] کوچولوی، چاق و چِلّە.

**خەت:** باریکە یەك لە قاقەزدان بەقەڵەم، کێڕ؛ ۲) نوسین؛ ۳) دێڕ؛ ۴) موی تازە لەروی لاو دەرهاتو: (تازە **خەتی** داوە)؛ ۵) هێڵی جوت [ف] ۱) خط؛ ۲) نوشتن؛ ۳) سطر؛ ۴) موی تازە برآمدهٔ روی نوجوان؛ ۵) خط‌های زمین شخم‌زدە.

**خەتا:** هەڵە، سوُچ، تاوان [ف] خطا.

**خەتات:** ۱) وەسمەی برۆ، ڕەنگ کە لە برۆ دەدرێ، خەنەو ڕەنگ؛ ۲) خۆش‌نوس [ف] ۱) وسمە؛ ۲) خطاط، خوشنویس.

**خەتاتی:** جوان نوُسین [ف] خوش نویسی، خطاطی.

**خەت‌دان:** ۱) خەت لێ‌دانی زەوی؛ ۲) شت نوسین؛ ۳) مو لەروهاتنی سادە [ف] ۱) شخم زدن زمین؛ ۲) نوشتن؛ ۳) برآمدن مو بر صورت نوجوان.

**خەت کەش:** ئامرازی خەتی ڕاست‌کێشان، ڕاستە [ف] خط کِش.

**خەت کێش:** خەت‌کەش [ف] خط کِش.

**خەتمی:** یاغی، سەربزێو، دژی قانون [ف] یاغی.

**خەتەنە:** سوننەت، کێر بڕینی منداڵ [ف] ختنە.

**خەتەنەسوُران:** بەزم و بانگ هێشتن بەهۆی سوننەت کردنی منداڵ [ف] ختنەسوران.

**خەتێ:** گوندێکی کوردستانە بەعسی وێرانی کرد [ف] نام روستایی کە بەوسیلە بعثیها ویران شد.

**خەتیبان:** گوندێکی کوردستانە بەعسی وێرانی کرد [ف] نام روستایی کە بەوسیلە بعثیها ویران شد.

**خەتیرە:** چوڵەچرا، چلوُسك، چلۆسك [ف] نیم‌سوز.

**خەج:** سوکەڵە ناوی خەدیجە، ناوی ژنانە [ف] مخفف خدیجە.

**خەجاڵەت:** فهێت‌کار، فەدیکار، تەریق [ف] خجالت.

**خەجاڵەتی:** ۱) شوُرەیی، عەیب؛ ۲) شەرمەزاری [ف] ۱) عیب و عار؛ ۲) مایە شرمندگی.

**خەجان:** خەج [ف] مخفَّف خدیجە.

**خەج‌خەجك:** گیایەکە گوڵێکی سوُری پیاڵەیی دەکا [ف] گیاهی است.

**خەج‌خەجۆك:** ۱) جۆرێ بۆق کە هەمیشە لە ئاودایە، جۆرێ قورواق؛ ۲) جۆرێ مارمیلکەیە دەڵێن لەئاگردا ناسوتێ [ف] ۱) نوعی قورباغە کە از آب بیرون نمی‌آید؛ ۲) نوعی مارمولك کە گویند در آتش نمی‌سوزد.

**خەجڵ:** خەریك، مژول بەکار [ف] سرگرم، مشغول.

**خەجلین:** داچڵەکین، شڵەژان [ف] یکە‌خوردن.

**خەجە:** خەج [ف] مخفَّف خدیجە.

**خەجێ:** خەج [ف] مخفَّف خدیجە.

**خەجیج:** خەج [ف] مخفَّف خدیجە.

**خەجیجۆك:** گیایەکە گوڵی سورە ف گیاهی با گلهای قرمز.
**خەدە:** خدە، نەریت، خوٌ ف خو، روش.
**خەر:** ١) کەر، ولاّخ، گویّ دریّژ؛ ٢) لەپاش وشە بەمانای: کرگاری: (کار ریّك خەر، گوریّس تیّك خەر) ف ١) خر، الاغ؛ ٢) پسوند فاعلی.
**خەرا:** ١) نەباش؛ ٢) ویّران؛ ٣) لەکار کەوتە ف ١) بد؛ ٢) ویران؛ ٣) تباه.
**خەڕا:** تیژ لە چیّژەدا ف تُندمزه و تیز.
**خەراب:** خەرا ف نگا: خەرا.
**خەرابە:** کاول، ویّرانە، کەلاوە ف ویرانە.
**خەڕات:** دارتاشی دارلوس کەر بەئامرازی تایبەتی ف تراشگەر، خرّاط.
**خەڕاتی:** کارخەڕات ف خرّاطی.
**خەرار:** جەواڵی لەمو، خەشە ف غرارە.
**خەڕاز:** وردەفرۆش ف خراز.
**خەراف:** تۆڕی ماسی گرتن ف تور ماهیگیری.
**خەرامان:** ١) لەنجەولار؛ ٢) ناوە بۆژنان ف ١) خرامان؛ ٢) اسمی زنانە.
**خەراو:** ١) لەکار کەوتە؛ ٢) خراپ؛ ٣) جویّن، سخیّف؛ ۴) ویّران ف ١) از کار افتادە؛ ٢) بد؛ ٣) دشنام؛ ۴) ویران.
**خەراو وتن:** سخیّف گوتن، جویّن‌دان، دژمان داین ف دشنام دادن.
**خەراو ویّژی:** خەراو وتن ف دشنام‌دادن.
**خەراوە:** خراپە ف نگا: خراپە.
**خەراوە کار:** دز، ریّگر ف راهزن.
**خەراوە کەر:** خەراوە کار ف راهزن.
**خەراوی:** خراپی، بەدفەڕی ف بدی، بدکاری.
**خەربار:** ١) باری کەر؛ ٢) کیّشیّکە بەرانبەری سیّسەد کیلۆ، خەروار، خەڵوار ف ١) بار اُلاغ؛ ٢) خروار.
**خەربەند:** غەربەنگ، گیایەکە بەریّکی وردی وەك تۆم خەشخاشی هەیە ف کرچك فرنگی.
**خەربەندە:** کەردار، ئاگاداری بارەبەران ف چاروادار.
**خەربەنگ:** خەربەند ف کرچك فرنگی.
**خەرپشت:** ١) کۆلکەی گەورە بۆ دەرگا داخستن؛ ٢) میچ‌وبانی لەخشت‌و بەتاق ف ١) کُندە کە بر پُشت درنهند؛ ٢) بام خشتی طاق‌نما، خرپُشتە.
**خەرپشتە:** میچی بەخشت، خەرپشت ف خرپُشتە.
**خەرپنگ:** زرەپنگ، پنگەی دەم ئاوی پیس ف نوعی پونهٔ وحشی.
**خەرپونگ:** خەرپنگ ف نوعی پونهٔ وحشی.
**خەرپونگە:** خەرپنگ ف نوعی پونهٔ وحشی.
**خەرت:** ١) ئاژەڵی دابەستە؛ ٢) بەران‌و نیّری چوارساڵەو بەرەو ژۆر؛ ٣) ئامرازی دارلوس کردن، ئامرازی خەڕات ف ١) بختە؛ ٢) شاك‌و قوچ چهارسالە و بەبالا؛ ٣) ابزار خراطی.
**خەرتا:** تیّری زیخ‌و رەڵم کیّشان ف جوال ریگ‌کشی.
**خەڕتاندن:** دەر کیّشان لە بن‌و رەگەوە ف از ریشە بیرون کشیدن.
**خەرتۆك:** پاشەرۆك ف نگا: پاشەرۆك.

**خەرتە:** ١) کیّڵانی وشکەزەوی دوٌرەباران؛ ٢) وەرد، دوبارە کیّڵان ف ١) شُخم زمین خُشك و سِفت؛ ٢) شخم دوبارە.
**خەرتەل:** خرتەل، سوٌرەداڵ، داڵاش ف لاشخور.
**خەرتەلە:** تۆویّکی تیژە، لەتایفەی ئیسیوەت‌و ئاڵات ف خردل.
**خەرج:** ١) بەخت کردن؛ ٢) باجی دەوڵەت؛ ٣) دراویّ کە رەشایی دەیدا بەئاغادیّ لەباتی خانوەکەی ف ١) خرج؛ ٢) مالیات؛ ٣) کرایە خانەای کە کشاورز بە مالك دە می‌پردازد.
**خەرج‌ودەخڵ:** مەسرەف‌و دەرامەت ف خرج و دخل.
**خەرجی:** ١) مەسرەفی رۆژانە؛ ٢) هەموانی: (نانی **خەرجی:** نان بۆ گش‌لا)؛ ٣) گۆ بەرۆك ف ١) مصرف و خرج روزانە؛ ٢) عمومی؛ ٣) زیوَر کنارهٔ یَلَك.
**خەرخودا:** ١) جاڵجاڵۆکە، کاکڵەموٌشان؛ ٢) داپیرۆشك ف ١) عنکبوت؛ ٢) خرخاکی.
**خەرخەشە:** ١) کیّشەو هەرا، قەرقەش؛ ٢) جغجغە، شەق‌شەقە ف ١) کشمکش و نزاع؛ ٢) جغجغە.
**خەردار:** دودار لەئاشدا کە لەبن داری ژیّر بەرداش دان ف دو چوب زیر چوب حامل سنگ آسیا.
**خەرداڵ:** خەرتەل ف لاشخور.
**خەردن:** گوندیّکی کوردستانە بەعسی ویّرانی کرد ف نام روستایی کە بە وسیلە بعثیها ویران شد.
**خەردەل:** خەرتەلە ف خردَل.
**خەڕرا:** بریقەدار، بەبریقە ف درخشان.
**خەڕرات:** خەڕات، دارلوس کەر ف خرّاط.
**خەڕراتی:** پیشەی خەڕات ف خرّاطی.
**خەڕرەمە:** نیّرە کەری فەحل ف نرّە خر گُشن.
**خەرز:** ١) گانی جانەوەران جگەلە مرۆ؛ ٢) گەرای کولەو میّروو ف ١) جفت‌گیری حیوانات؛ ٢) تخم ملخ و مور.
**خەرس:** قەرس، خەمڵ، بەراورد ف تخمین، برآورد.
**خەرسانن:** قەرساندن، بەراوردکردن ف تخمین زدن، برآورد کردن.
**خەرسکردن:** قەرساندن ف تخمین زدن.
**خەرسەك:** ١) مافوٌرەی بەکوڵکە؛ ٢) کولیّرەی ئەستور؛ ٣) کڵۆکڵ ف ١) قالی پرپشت؛ ٢) گردهٔ کُلفت؛ ٣) کلوخ.
**خەرشۆڤ:** زەوی نابابەت بۆ کیّڵان ف زمینی کە کاشتن را نشاید.
**خەرشەب:** ئەسکویّ، ئەسکو، کەوچکی زەلامی کلك دریّژ ف ملاغە.
**خەڕف:** لەبەر پیری هۆش نەماو ف خَرَف، پیر خرفت.
**خەڕفاو:** خەڕف ف خَرَف.
**خەڕفتی:** خەرفاو ف خَرَف.
**خەرفی:** خەرف ف خَرَف.
**خەرفیو:** خەرفی ف خَرَف.
**خەرقە:** باڵاپۆشی دەرویّش ف خرقە، جبهٔ درویش.
**خەڕقین:** شەمتین، خلیسکان ف لیز خوردن.
**خەرك:** ١) داری دریّژی سیّ پیّچك کە تاوانباری لەسەر بەرقامچی دەدەن؛

٢) دوتای دارین کە لەسەر پشت باربەر دادەنرێ بۆ بەردکێشان [ف] ١) سەپایهٔ فلك؛ ٢) چوب دوسری کە بر پشت باربر برای حمل سنگ گذارند.

**خەرکان:** خرکانه [ف] نگا: خرکانه.

**خەرکانە:** خرکانه [ف] نگا: خرکانه.

**خەرکاو:** خەریك، مژول [ف] مشغول، سرگرم.

**خەرکنج:** قرژانگ، قرژاڵ [ف] خرچنگ.

**خەرکۆڵ:** کەرکۆڵ، گیایەکی سەرزلی بەدڕکە [ف] گیاهی است خاردار.

**خەرکـەمـان:** ئامـرازی چەماندنەوەی کەللە بێژنگ‌و کەمەی دەف [ف] وسیلهٔ خم کردن چنبر دف و غربال.

**خەرکەوان:** خەرکەمان [ف] نگا: خەرکەمان.

**خـەڕك:** ١) هامێز، بـاوەش؛ ٢) نێـوانی ران، ناوگەڵ؛ ٣) بن هەنگـڵ؛ ٤) فورو چڵپاو [ف] ١) آغوش؛ ٢) انتهای ران؛ ٣) زیر بغل؛ ٤) گل‌ولای.

**خەرگا:** خێوەتی زۆرگەورەی پیاوی گەورە [ف] خیمهٔ بزرگ.

**خەرگوڕ:** کەرەکێوی، گوڕ [ف] گورخر.

**خەرگوڵك:** کەرەکێوی [ف] گورخر.

**خەرگە:** پەڕۆی کۆن‌و پیس [ف] لَتّه پارچهٔ کهنه و کثیف.

**خەرگەلە:** ١) کەرلەوەڕێن؛ ٢) بریتی لە پیاو پیس و پۆخڵ و کۆنە پۆش [ف] ١) خر چران؛ ٢) کنایه از آدم کثیف.

**خەرمـان:** ١) خرمـان، بێدەر؛ ٢) مژی دەوری مانگ: (شەوە، ئەستێرە بەزریوەن لە سەرمـان / لە مانگی روت هەنـاسـەم بۆتـە **خەرمـان**) «هەژار» [ف] ١) خرمن؛ ٢) هاله.

**خەرمانان:** ١) شەشەمین مانگی ساڵ؛ ٢) جەنگەی خەرمان هەڵگرتن [ف] ١) شهریورماه؛ ٢) موسم برداشت محصول.

**خەرماناوا:** دوعای پیت بۆ خەرمان [ف] دعای برکت خَرمَن.

**خەرمـان بەرەکـەت:** ١) نزا بۆ زور بونی خرمـان؛ ٢) بەخششێ کە خاوەن خەرمان ئەیدا [ف] ١) دعا برای زیاد شدن خرمن؛ ٢) بخشش صاحب خرمن.

**خەرمانپێو:** کەسێ کە خەرمان بەکیلە دەپێوێ [ف] خَرْمَن کیل.

**خەرمان پێوان:** بێدەر بەکیلە ورگەڕاندن [ف] خرمن پیمانه‌کردن با کیل.

**خەرمان سوُر:** ١) کۆ گەتمی خەرمان؛ ٢) وەختی خەرمانان [ف] ١) راش؛ ٢) موسم برداشتن خَرمَن.

**خەرمـان سوُرانە:** بانگێشتن بەهۆی سوُربوُنی خەرمانەوە [ف] جشن و سور آماده شدن خَرمَن.

**خەرمـان سوُربـوُن:** پێ‌گەیشتنی خەرمـان، دان لەکا جوێ بوُنەوە [ف] آماده شدن خرمن.

**خەرمانگا:** جێ‌خەرمان، شوێنێ کە بێدەری لەسەرە [ف] جای خرمن.

**خەرمان لۆخانە:** شیرنی خەرمان سوُربوُن [ف] سور آماده شدن خرمن.

**خەرمان لۆخە:** خەرمان لۆخانە [ف] سور آماده‌شدن خرمن.

**خەرمان لۆغانە:** خەرمان لۆخانە [ف] سور آماده شدن خَرمن.

**خەرمان لۆغە:** خەرمان لۆخە [ف] سور آماده شُدن خَرمن.

**خەرمانە:** تەم‌و مژێ کە لەبەرچاو بوێتە کەمەی دەوری مانگ [ف] هاله.

**خەرمانەدان:** مانگی بەخەرمانە: (قەسەم بەومانگەی **خەرمانەی داوە** / هەرگیز مەیلی تۆم وەلا نەناوە) «فولکلۆر» [ف] هاله داشتن ماه.

**خەرمانەسوُران:** خەرمان سورانە [ف] جشن برداشتن خرمن.

**خەرمان هەڵگرتن:** کاتی خەرمان پێوان‌و بردنەوەی بۆماڵ [ف] خرمن برداشتن.

**خەرمشك:** جرج، مشکەکوێرە [ف] موش کور.

**خەرمـوُرگ:** موُروە کەرانە، موروُی درشت‌و شین. بەکورتانی کەرەوە دەی دروُن [ف] خَرمُهره.

**خەرمـەخیل:** بەرگاویلکـە، داك ماکـەری باب ئەسپ [ف] قاطـری کە مادرش الاغ و پدرش اسب است.

**خەرمەگەز:** کەرمێش، مێشی گەورەتر لە مێشی ئاسایی [ف] خرمگس.

**خەرناز:** نازو ئەدای کەسێ کە بۆ نازکردن ناشێ [ف] ناز کردن بی‌مزه و سبك.

**خەڕناش:** کونەلوُت، کونەتفنگ، کونای لوُت [ف] سوراخ بینی.

**خەرۆ:** ١) لەخـۆبـایی، غلور؛ ٢) فریودراو، خەڵـەتـاو [ف] ١) مغـرور؛ ٢) فریب خورده.

**خەروا:** ١) جۆرێ کولـێرەی ناودار کە لەژێر ژیلەمـۆ دەبـرژێ؛ ٢) نانەقەیسی‌و نانەهەنجیر [ف] ١) نوعی گردهٔ مغزدار؛ ٢) لواشك.

**خەروار:** خەربار، کێشێکە بەرانبەر بەسێ سەد کیلو [ف] خروار.

**خەروێ:** کەروێشك، کەورێشك [ف] خرگوش.

**خەرە:** دیواری لە وشکەبەرد، دیواری لەکوچك بێ هەڕ [ف] دیوار از سنگ بی‌ملات.

**خەڕە:** ١) لەخۆبایی، بەفیز، لوت‌بڵند؛ ٢) قوڕ،حەڕی، هەڕ [ف] ١) مغرور؛ ٢) گِل.

**خەرەبەنگ:** خەربەنگ، غەربەنگ [ف] گیاهِ هر بنگ.

**خەرەزەن:** قامچی زلی کەڵ ئاژۆتن [ف] نوعی شلاق برای ستور.

**خەرەف:** خەرْف: (ئەو پیر وخەرەف، ئافەتی مەڕواو سەفابو / تۆ شۆخ‌و جوان، دوربی لەئافاتی خەرافات) «نالی» [ف] خَرَف.

**خەرەفان:** لەپیری هۆش نەمان [ف] خرفیدن.

**خەرەفاو:** هۆش نەماو لەبەر پیری [ف] خرفیده.

**خەرەفیاگ:** خەرەفاو [ف] خرفیده.

**خەرەفیان:** خەرەفان [ف] خرفیدن.

**خەرەفین:** خەرەفان [ف] خرفیدن.

**خەرەفی:** خەرەفاو [ف] خرفیده.

**خەرەفیو:** خەرەفاو [ف] خرفیده.

**خەڕەك:** دەزگای پەموُرستن، ئامرازی لۆکەرێسی [ف] ماشین پنبه‌ریسی.

**خەڕەم:** خەڕەم، نێرەکەری فەحل [ف] نرّه‌خر کُشن.

**خەرەنـد:** ١) خەندەك، قوڵکەی درێژی لەزەمین کەندراو؛ ٢) قوڵکە بۆ کۆبوُنەوەی ئاوی پیس [ف] ١) خندق؛ ٢) پارگین.

**خەرەنگـەز:** مۆزەشینـە، مێشێکی کەسکی درشتـە بەئـاژەڵی بەرزەوە دەدات [ف] خرمگس سبزرنگ.

**خەرەنگەزە:** خەرەنگەز ف خرمگس سبزرنگ.

**خەڕی:** قوڕ، حەڕی، هەڕ، هەڕگ ف گِل.

**خەریب:** ۱) غەریب، ئاوارە؛ ۲) بێگانە، بیانی؛ ۳) سەیرو سەمەرە؛ ۴) دەنگ و ئاوازی خەمگینانە؛ ۵) بەلەنگازو بیچارە ف ۱) آوارە؛ ۲) بیگانە؛ ۳) عجیب؛ ۴) نوای حزین؛ ۵) بیچارە.

**خەریبۆك:** جۆرێ هەرمێ ف نوعی گلابی.

**خەریبە:** ئاوارە، لاوەکی ف آوارە.

**خەریتە:** ۱) فیشەکدان؛ ۲) نەخشە، شکڵی ولات لەسەر نەخشە ف ۱) تیردان؛ ۲) نقشۀ جغرافیائی.

**خەریك:** بەکارەوە مژول ف مشغول بە کار.

**خەریکە:** ۱) خەریك؛ ۲) بەکارەوە سەرگەرمە ف ۱) مشغول؛ ۲) مشغول است.

**خەرین:** پرخە کردن لە خەوا ف خرناس کشیدن در خواب.

**خەز:** ۱) جانەوەرێکە لەتیرەی ڕێوی. کەوڵەکەی زۆر بە نرخە؛ ۲) چەوری: (هەموی **خەز**و بەزە) ف ۱) خز، حیوانی کە پوستش باارزش است؛ ۲) چربی.

**خەزا:** جەنگ لەڕای خودا ف جهاد.

**خەزال:** خەزاڵ ف نگا: خەزاڵ.

**خەزاڵ:** ۱) کەژاڵ، ئاسك، مامز؛ ۲) ناوە بۆ ژنان؛ ۳) بزنی گوێ خەنەیی و بەدەن ڕەش و بۆر؛ ۴) بزنی لاجانگ خەنەیی و لەش بۆر ف ۱) آهو؛ ۲) نامی زنانە؛ ۳) بُز گوش‌قرمز بدن سیاە؛ ۴) بُز خاکستری گوش قرمز.

**خەزام:** ۱) پایز، کژی دوای هاوین؛ ۲) گەڵاڕێزان؛ ۳) خەزەڵ، گەڵای زەردی پایز ف ۱) خزان؛ ۲) برگ‌ریزان؛ ۳) برگ خزان.

**خەزان:** ۱) دەمی خەزەڵوەر، گەڵاڕێزان، خەزام؛ ۲) قازان، بەڕۆش، مەنجەڵ؛ ۳) تیانی حەمام ف ۱) برگ‌ریزان؛ ۲) دیگ مسی؛ ۳) خزانۀ گرمابە.

**خەزان کردن:** زەردهەڵگەران و داوەرینی گەڵا ف زردشدن و ریختن برگ.

**خەزایی:** عەینەمەل، مەلی دوژمنی کلۆ ف سار ملخ‌خوار.

**خەزر:** ۱) تووڕەیی، رك بوونەوە؛ ۲) مان، پێ چەقاندن ف ۱) خشم؛ ۲) سرسختی.

**خەزرین:** ۱) دەڕکەوە چوون؛ ۲) مان گرتن ف ۱) خشمگین شدن؛ ۲) اعتصاب کردن.

**خەزریو:** ۱) غەزریو، دەڕکەوە چووگ؛ ۲) مان گرتو ف ۱) خشمگین شُده؛ ۲) اعتصاب کردە.

**خەزگ:** ۱) خز، لوس: (ئەم چیتە زۆر **خەزگ** بو)؛ ۲) بەرگی ئاوریشم، حەریر؛ ۳) سەرەولێژ، کوڕ ف ۱) لیز؛ ۲) حریر؛ ۳) سراشیبی.

**خەزگاڵ:** خۆزی، کاشکا ف ای کاش.

**خەزگان:** قازان، بەڕۆش ف دیگ.

**خەزن:** ۱) ژن خوشك، خوشکی ژن؛ ۲) هەڵگرتن لە شوێنێك ف ۱) خواهر زن؛ ۲) نگهداری در جایی.

**خەزنە:** ۱) خەزێنە، گەنج، گەنجینە؛ ۲) تیانی حمام ف ۱) گنجینە؛ ۲) خزانۀ حمام.

**خەزوور:** باوکی مێردو باوکی ژن ف پدر همسر.

**خەزوورە:** خەزوور ف پدر همسر.

**خەزوك:** هەرجانەوەرێ لەسەر زك دەڕوا ف خزندە.

**خەزەڵ:** ۱) گەڵای زەردی پایز؛ ۲) بزنێ کە موی دەست و پیلی زەرد بێت ف ۱) برگ خزان؛ ۲) بزی کە موهای دست و شانەاش زرد باشد.

**خەزەڵوەر:** ۱) گەڵاڕێزان؛ ۲) مانگی هەشتەمی ساڵ ف ۱) برگ‌ریزان؛ ۲) مهرماه.

**خەزەڵ وەرین:** گەڵا داکەوتن لە داران ف برگ‌ریزی.

**خەزەڵ وەرێن:** کاتی گەڵاوەرینی داران، گەڵاڕێزان ف موسم برگ‌ریزان.

**خەزیر:** خەزوور ف پدر همسر.

**خەزێم:** ئاڵقەی نێوان کونەلووت بۆ جوانی ف حلقۀ زیور بینی.

**خەزیموك:** شیوی چەوەندەرو گەنم ف آش شلغم و گندم.

**خەزێمۆك:** گیایەکە گوڵی زەرد دەکا ف گیاهی با گلهای زردرنگ.

**خەزێنە:** خەزنە ف خزانە.

**خەس:** ۱) شلی توندەوەبو، تیر، دژی تراو؛ ۲) بێ گونی ف ۱) غلیظ؛ ۲) اختگی.

**خەسار:** ۱) داری ژێر کاریتە بۆ دیوار لەقورسایی کاریتە پاراستن، حەماڵ؛ ۲) زیان، زەرەر؛ ۳) بەفیڕۆ چووگ ف ۱) ستون چوبی کە دیوار را تقویت کند؛ ۲) زیان؛ ۳) هَدَر رفتە.

**خەسارە:** داری ژێر کاریتە، خەسار ف ستون چوبی خانە.

**خەسارەت:** زیان، زەرەر ف زیان.

**خەساس:** گون دەرهێن، کەسێ کە نێر بێ گون دەکا، وەستای گون دەرهێنان ف اختە کُنندە.

**خەسان:** هێلکەگون دەرهاتن ف اختە شُدن.

**خەساندن:** ۱) گون دەرهێنان؛ ۲) سەرلك پەڕاندنی دار ف ۱) اختەکردن؛ ۲) هَرَس درخت.

**خەسانن:** خەساندن ف نگا: خەساندن.

**خەساو:** ۱) گون دەرهاتگ؛ ۲) سەرلك پەڕێندراو ف ۱) اختە شُدە؛ ۲) هَرَس شُدە.

**خەسپال:** لەکار کەوتە، زورهان ف از کار افتادە.

**خەست:** تیر، خەس، هەس، دژی تراو ف غلیظ.

**خەستاو:** خەست ف غلیظ.

**خەست و خۆڵ:** ۱) خەست و بەلەزەت؛ ۲) برێتی لە سەرخۆشی زۆر مەست ف ۱) غلیظ و پُرمایە؛ ۲) شش‌دانگ مَست.

**خەستە:** ۱) ماندو؛ ۲) نەخۆش؛ ۳) دۆی دەتوورەکە کراو ف ۱) خستە؛ ۲) بیمار؛ ۳) دوغ چکیدە.

**خەستەخانە:** نەخۆش‌خانە: (لەدەوری **خەستەخانە**ی عیشقی ئەو سەوزەی کەواشینە / لەسەر هەر خەستەیێ یا خوێندنی یاسینە، یاشینە) «مەحوی» ف بیمارستان.

**خەستەك:** ڕەنگی شینی تۆخ، کەوەی تاریك ف کبود تیرە.

**خەستی:** تیری، خەسی، دژی تراوی، بەرانبەری شلی ف غلظت.
**خەسرك:** قەرتاڵەی‌زل، تریانی گەورە ف سبد بزرگ.
**خەسرەو:** ناوە بۆ پیاوان ف نام مردانه.
**خەسرەوانی:** کوپەی زۆر زل ف خم بُزرگ.
**خەسك:** گیایەکە گوڵی زەردی هەیە ف گیاهی با گلهای زردرنگ.
**خەسڵەت:** رەوشت، خو، ئاکار ف روش، اسلوب.
**خەسوُ:** دایکی ژن‌و دایکی مێرد ف خاش، مادر همسر.
**خەسوك:** گون دەرهێنەر، خەساس ف اخته‌کننده.
**خەسە:** خەستە ف نگا: خەستە.
**خەسەخانە:** خەستەخانە ف بیمارستان.
**خەسی:** خەسوُ، داڵکی ژن‌و شو ف مادر همسر، خاش.
**خەسیاگ:** خەساو، گون‌دەرهاتگ ف اخته‌شُده.
**خەسیاو:** خەسیاگ ف اخته‌شُده.
**خەسیس:** رەزیل، چروُك، رژد، چکوُس، دەس‌قوُچاو ف خسیس.
**خەش:** کەمایەسی، عەیب: (رۆنێکە **خەشی** تێدا نیە) ف نقص، غش.
**خەشخاش:** خاشخاش ف نگا: خاشخاش.
**خەشخاشك:** گوڵاڵە سورەی بەهاران ف شقایق.
**خەشکاندن:** خلیسکاندن ف لیزاندن.
**خەشکین:** خلیسکان ف لیزخوردن.
**خەشۆ:** گێل‌و نەزان، بلح، هەقمەق ف اَبْلَه، اَحْمَق.
**خەشە:** خەرار، جەواڵی لەمو ف جوال کُرکین.
**خەشیفك:** هۆر، جەواڵی یەك‌سەری زەلام ف جوال بزرگ.
**خەشیقولك:** سەرەوژێری، خلیسك، سەرەولێژایی ف شیب تُند، سراشیبی.
**خەشیل:** خوشیلك ف گیاهی است.
**خەشیم:** فێرەکار نەکراو، ناشی، کارنەزان ف ناشی.
**خەف:** ۱) نهێنی، نادیاری؛ ۲) خەو، خاو ف ۱) نهانی؛ ۲) خواب.
**خەفان:** ۱) خەوتن، نوستن؛ ۲) نەوی‌بون لە درێژەوە ف ۱) خُفتن؛ ۲) خوابانیده شُده.
**خەفاندن:** ۱) دانەواندن، چەماندنەوە؛ ۲) دەخەوکردن ف ۱) خوابانیدن؛ ۲) در خواب کردن.
**خەفانن:** خەفاندن ف نگا: خەفاندن.
**خەفتان:** ۱) تۆمی بەزەوی وشکەوە کراو؛ ۲) کراسی ئاوریشم لەبن زرێوە؛ ۳) سەرۆکی گەمیە؛ ۴) جۆرێ کەوا؛ ۵) چاوەنۆڕی دەرفەت ف ۱) تخم پاشیده به زمین خشك؛ ۲) کژاغند؛ ۳) ناخدا؛ ۴) نوعی قبا، سرداری؛ ۵) پی فرصت بودن.
**خەفتگ:** ۱) نوستوُ، خەوتو، خەولێ کەوتوُ؛ ۲) چەمینراوی بەسەر زەویدا راکێشراو ف ۱) خوابیده، بەخواب رفته؛ ۲) بر زمین خوابانیده شُده.
**خەفتن:** نوستن، نقستن ف خوابیدن.
**خەفتو:** ۱) نوستوُ، خەفتگ؛ ۲) مۆتە، مۆتەکە ف ۱) خُفته؛ ۲) کابوس.
**خەفتیان:** ساردەپایز کە تازە ناشێ توی تێدا بچێنن ف سرمای پاییز که اجازهٔ کشت ندهد.
**خەفج:** مۆتەکە، مۆتە، خەفتوُ ف کابوس.
**خەف‌زان:** ۱) فاڵ گرەوە؛ ۲) زانا بەنادیاریان ف ۱) فالگیر؛ ۲) غیب‌گو.
**خەفك:** ۱) تەڵە، خەپك؛ ۲) ئامرازێکە لە هەوجاردا ف ۱) تله؛ ۲) ابزاری در خیش.
**خەفگ:** خەفك ف نگا: خەفك.
**خەفگە:** ۱) جێ‌خەو، جێگەی نوستن؛ ۲) تەرە ف ۱) خوابگاه؛ ۲) گودال مخصوص نگهداری میوه و برگ توتون.
**خەفوُر:** ۱) ناوی خوا؛ ۲) ناوە بۆ پیاوان ف غفور. ۱) نام خدا؛ ۲) نامی برای مردان.
**خەفوك:** ئەوگایەی لەخەتی جوُت‌دا دەخەوێ ف گاوی که هنگام شخم می‌خوابد.
**خەفە:** ۱) خانوی بێ روُناکایی؛ ۲) گڕەئاگری کز؛ ۲) پشو لێ‌بڕاو؛ ۴) کوُژانەوەی ئاگر؛ ۵) خنکاو ف ۱) خانهٔ کم‌نور؛ ۲) زبانهٔ ضعیف آتش؛ ۳) بی‌حرکت و تکان؛ ۴) خاموش شدن آتش؛ ۵) خفه‌شُده.
**خەفەت:** خەم، کەسەر، کول، مەینەت، جغار ف غم.
**خەفەتبار:** دل‌بکول، مەینەت‌بار، خەمبار ف غمگین.
**خەفەتباری:** خەمخۆری ف اندوهناکی.
**خەفەت خواردن:** خەم‌خواردن ف غُصّه خوردن.
**خەفەکردن:** ۱) کزکردنی گڕی چرا؛ ۲) کزکردنی تینی سەماوەر؛ ۳) پشو لێ بڕین؛ ۴) بڕێتی لەبێدەنگ کردن؛ ۵) خنکاندن ف ۱) کم کردن شعلهٔ چراغ؛ ۲) کم کردن سماور؛ ۳) بی‌حرکت ساختن؛ ۴) کنایه از ساکت کردن؛ ۵) خفه کردن.
**خەفیاگ:** لکی چەمێنراوی ژێرخاك کراو ف شاخهٔ زیر خاك خوابانیده و جوانه زده.
**خەفیە:** زوان‌گیر، خەوەرچین ف خبرچین.
**خەڵ:** ۱) کوُزی لەبەرد بوُ ئاژەڵ؛ ۲) سەنگەر بوُ شەڕ؛ ۳) خەڵك، مەردم ف ۱) آغُل سنگی برای دام؛ ۲) سنگر؛ ۳) مردُم.
**خەلا:** ئاودەست، سەرپێشاو، مەوال ف مُستراح.
**خەڵات:** ۱) دیاری گەورەپیاوان؛ ۲) بڕێتی لە کفن ف ۱) خَلْعَت؛ ۲) کنایه از کفن.
**خەڵاتی:** بەخشراو، لەلایەن کەسێکەوە پێشکەش کراو ف پیشکشی.
**خەلاس:** ۱) دوایی هاتگ؛ ۲) رزگار ف ۱) باقی نمانده؛ ۲) رهایی یافته.
**خەلاسی:** رزگاری، نەجات ف رهائی.
**خەلاموُر:** سکڵ، پۆل، پەن ف اخگر.
**خەلان:** ۱) سەنگەران؛ ۲) کوُزی ئاژەڵان لەدەشت؛ ۲) ناوی دوگوند لە باڵەکایەتی؛ ۴) شکانی ئێسکی قاچ‌و دەست ف ۱) سنگرها؛ ۲) آغـل‌های بیابانی؛ ۳) نام دو دهکده در کُردستان؛ ۴) شکستن استخوان ساق و بازو.
**خەڵهوت:** ژەکی سەر ئاگر نریاو، فروُ ف آغوز منعقد شُده بر اثر حرارت.
**خەڵتان:** گەوزان، تێوەچوُن: (**خەڵتانی خوێن**) ف غرقه، آلوده.

**خەڵتانە:** گیای ددان ئاژن. *گیایەکە لاسك ناسك وشکی دەکەن بۆ ددان ئاژنین* [ف] گیاه خلال.

**خەلستن:** رزگاربوُن، دەرچوُن‌و نەجات‌بوُن [ف] رهایی یافتن.

**خەلسك:** زەنگەتە تریّ [ف] تلسك انگور.

**خەڵف:** لکی یەك‌ساڵە، لقەداری ئەمساڵ [ف] جوانە، شاخهٔ یك سالە.

**خەڵفە:** بەردەستی وەستای پیشەساز [ف] دستیار اُستادکار.

**خەڵق:** ۱) مەردم، عالـەم؛ ۲) دانیشتو، ئەهـل: (**خـەڵقـی کوێـی؟**)؛ ۳) کەسی دیتر [ف] ۱) مردُم؛ ۲) اهل، ساکن؛ ۳) دیگر کس.

**خەلقنۆ:** ئەی مەردم [ف] ای مردُم.

**خەلقۆ:** خەلقنۆ [ف] ای مردُم.

**خەڵقوخوا:** هەموُکەس [ف] همهٔ مردم.

**خەڵقی:** کەسانی‌تر [ف] دیگر کسان.

**خەڵقینە:** ئەی مەردم، خەلقۆ [ف] ای مردُم.

**خەڵك:** خەڵق [ف] نگا: خەڵق.

**خەڵك‌وخوا:** خەڵقو خوا [ف] خلق خُدا، مردم.

**خەڵکی:** خەڵقی [ف] کسان دیگر.

**خەڵکینە:** ئەی مەردم [ف] ای مردُم.

**خەلۆ:** سوُکەڵەناوی خەلیل [ف] مُخفَّفِ خلیل.

**خەڵوا:** بەدەست پانەوەکراو [ف] با دست پهن‌شُده.

**خەڵۆتە:** ئەشکەولەت، بنەدیزەو گۆزەی شکاو، جێ‌خۆراکی سەگ‌و... [ف] سُفال شکسته، ظرف غذای سگ و...

**خەڵۆز:** رەژی، رەژو، زوُخاڵ، کۆمر [ف] زُغال.

**خـەڵـوُزان:** رەژی‌دان، جێـگەی رەژی، زوخـاڵدان [ف] انبارِ زُغال، زُغالدان.

**خەڵوُزدان:** خەڵوُزان [ف] زُغالدان.

**خەڵوُزە:** بەڵایەکە بۆ شینایی‌و دەخڵ. گەڵا رەش هەڵدەگێرێ [ف] آفتِ نباتی سیاه شدن برگها.

**خەلـۆل:** ۱) میچـە گوێلك، جگـەگۆلـك؛ ۲) بریتی لەزەلامی ناقـۆڵا، زەبەلاح [ف] ۱) قاپ گوساله؛ ۲) کنایه از گُندهٔ بدقواره.

**خەڵوە:** چلەکێشی، تەنیا رابواردنی سۆفی بۆ چلەکێشان [ف] چله‌نشینی.

**خەڵوەت:** جێگەی تەنیایی [ف] جای دنج، خلوت.

**خەڵوەت‌خانە:** جێگەی چلەکێشانی پیر [ف] جایی که در آن چلّه نشینند.

**خەڵوەتی:** وچخانە، ژوُری ئەرزاق، عەماریُ پشت ژوُری رۆنیشتن [ف] پستو.

**خەلە:** دانەوێڵە، دەخڵ، دەغل [ف] غلّه.

**خـەڵـەت:** ۱) جوێن، سخێف؛ ۲) هەڵـە، سەهو؛ ۳) فریو [ف] ۱) فحـش؛ ۲) اشتباه؛ ۳) فریب.

**خەڵەتان:** فریوخواردن [ف] فریب‌خوردن.

**خەڵەتاندن:** فریودان، هەڵ فریواندن، دەسخەرۆکردن [ف] فریب دادن.

**خەڵەتانن:** خەڵەتاندن [ف] فریب دادن.

**خەڵەتاو:** تەفرەدراو، فریودراو [ف] فریب‌خورده.

**خەڵەتێن:** فریو دەر، تەفرەدەر [ف] فریبنده.

**خەڵەف:** ۱) تێکوڵی دار؛ ۲) گەڵای دەوری گوڵی دار؛ ۳) فریو؛ ۴) ناو بۆ بیاوان [ف] ۱) پوستهٔ درخت؛ ۲) برگهای اطراف شکوفه؛ ۳) فریب؛ ۴) نام مردانه.

**خەڵەفاگ:** هەڵخەڵەتاو، خەڵەتاو [ف] فریب‌خورده.

**خـەڵـەفـان:** ۱) خەڵـەتان، فریودران؛ ۲) خەرفان [ف] ۱) فریب خوردن؛ ۲) خرفیدن.

**خەڵەفاو:** ۱) فریودراو؛ ۲) خەرەفیو [ف] ۱) فریب خورده؛ ۲) خرفیده.

**خەلەفرۆش:** دانەوێڵە فرۆش، عەلاف [ف] غلّه فروش.

**خەڵەفیاگ:** خەرەفیو [ف] خَرَف شُده.

**خەڵەفین:** خەرەفان [ف] خرف شدن.

**خـەلـەك:** ۱) گەو، ئاڵقە؛ ۲) موی لێـك هاڵاو، موی سەری بەپێچ [ف] ۱) حلقه؛ ۲) موی فرفری.

**خەلـەکـان:** گونـدێکی کوردستانە کە بەعسی وێرانی کرد. *زێدی ابن خلکـانی بە ناوبانگە* [ف] نام روستایی که به‌وسیله بعثیها ویران شد. *زادگاه ابن خلکان*.

**خەلەکوان:** خوڵەکەوە، مشکی، تۆزینە، بوُڵ [ف] خاکستر.

**خەلەکە:** بازنەیەکی دارینە لە هەوجاڕدا [ف] از ابزار خیش.

**خەڵەڵە:** ۱) خڕی لوڵەپی، خڕی لوُلەیی؛ ۲) لەلەی کێری بڕاو [ف] ۱) استوانه‌ای؛ ۲) جای ختنهٔ پسران.

**خەلەندۆر:** ۱) گندۆر، قەلەندۆر، دۆریە؛ ۲) فرۆ [ف] ۱) گیاهی است؛ ۲) آغوز.

**خەلەنگ:** گەزگەسك، گەزگەزك، گیایەکە پیاو ئەگەزێ [ف] گزنه.

**خەلیان:** ترازانی ئێسکی لەش [ف] از جا در رفتن استخوان.

**خەلیت:** تەریقەو پشتاوو باروُت‌و چەشنی‌و پەڕۆی تفەنگی رەشۆکی [ف] ابزار و مواد تفنگ سرپُر.

**خەلیتە:** قەڵادەی سەگ‌و تاژی [ف] قلّادهٔ سگ شکاری.

**خەلیش:** دارستانی چوغر، لێڕەواری پڕوچڕ [ف] جنگل انبوه.

**خەڵێف:** پلوُرە، ماڵی مێشـەنگوین کە لە شوُڵ دەی‌تەنن [ف] کندوی از ترکه ساخته شده.

**خەڵیفان:** ناوی چەند گوندێکە لە کوردستان [ف] نام چند روستا در کردستان.

**خەلیفە:** ۱) راسپاردەی شێخی تەریقەت لە بریکاری شێخ؛ ۲) سەرۆکی موسوڵمانان [ف] ۱) خلیفهٔ پیر طریقت؛ ۲) خلیفهٔ مسلمین.

**خەلیلان:** ناوی هۆزێك و ناوچـە یەکی کوردستـانـە [ف] نام طایفـه و منطقه‌ای در کردستان.

**خەلیلە:** گیای دان‌ئاژن [ف] گیاه خلال.

**خەلێڵە:** دودڵی، بێ‌باوەڕ بوُن [ف] بدگُمانی، شك.

**خەلیلی:** ۱) جۆرێ هەنگوری سپی کە زوتر پێ دەگا؛ ۲) زنجیری لاقی زینـدانـی. *دەگەڵ کۆت دەگوترێ*: (**کـۆت‌و خـەلـیـلی**) [ف] ۱) نوعی انگور زودرس؛ ۲) زنجیر پای زندانی.

**خەم:** ۱) غەم، کەسەر؛ ۲) چەم، چەماو [ف] ۱) غم، اندوه؛ ۲) خم.

**خەمازە:** داری قولاپی ماسیان [ف] چوب قُلاب ماهیگیر.

**خەمان:** ١) زۆر کوڵو کەسەر؛ ٢) خاڵەخەمە، مامەخەمە، کەسێ دەخەمی هەموکەس دایە؛ ٣) سوکەڵەی ناوی رەحمان [ف] ١) غم بسیار؛ ٢) دلسوز و غم‌خور همگی؛ ٣) مُخَفَّف عَبدُالرَّحمٰن.

**خەماوی:** ١) خەمبار، دڵ‌تەنگ؛ ٢) کاریان کارەساتێك کە پیاو خەمگین دەکا [ف] ١) دل‌تنگ؛ ٢) مایۀ دلتنگی.

**خەمبا:** خانەبا [ف] وَرَمِ اندام.

**خەمبار:** دڵ‌تەنگ، خەمگین [ف] غمگین.

**خەمتین:** کزبوُنی ئاگر [ف] کم سو شدن آتش.

**خەمچوُر:** قەمچوُر، پوشانەو سەرانەی ماڵات بۆ ئاغاو دەوڵەت [ف] مالیات بر دام.

**خەمخوار:** ١) دڵ‌تەنگ؛ ٢) کەسێ کە خەم لەپیاو دەخوا، دڵسۆز [ف] ١) غمگین؛ ٢) غمخواره.

**خەمخۆر:** خەم‌خوار [ف] نگا: خەم‌خوار.

**خەمخۆرك:** قەڵشی زەوین لەبەر بێ‌ئاوی [ف] ترك خوردن زمین از بی‌آبی.

**خەمخۆرکە:** خەم‌خۆرك [ف] ترك خوردن زمین از بی‌آبی.

**خەمخۆره:** ١) مشورخۆره، سەرپەرستی دڵسۆز؛ ٢) شاهۆ، مەلێکە [ف] ١) سرپرست دلسوز؛ ٢) پرندۀ بوتیمار.

**خەمخۆری:** ١) خەم‌خواردن، دڵ‌تەنگ بوُن؛ ٢) سەرپەرستی کردنی دڵسۆزانە [ف] ١) غُصّه خوردن؛ ٢) غم‌خوارگی.

**خەمخەموك:** گوڵی رەز، شکۆفەی داری مێو [ف] شکوفه درخت انگور.

**خەمخەموکە:** خەم‌خەموك [ف] نگا: خەم‌خەموك.

**خەمرك:** کانی‌و شینایی لەناو بیاباندا [ف] واحه.

**خەمرە:** ١) قوڵکەی ئاو تێدا وەستاو؛ ٢) کوپەی زۆر زەلام [ف] ١) گودال آب؛ ٢) خُم بزرگ.

**خەمرەوێن:** ئاودەنگی، وەروێرکە [ف] غم‌زُدا، مونس.

**خەمری:** ١) پەرچوکە، پرچی سەرتوێڵ؛ ٢) توێڵ پیچ، ئەنی‌بەند [ف] ١) زلف روی پیشانی؛ ٢) پیشانی‌بند.

**خەمزە:** ١) نازی بەچاوان؛ ٢) ناوی گوندێکە لەشار باژێڕی کوردستان [ف] ١) غمزه و ناز؛ ٢) نام دهکده‌ای در کُردستان.

**خەمسار:** گوێ نەدەر بەکار، خۆڵەکار بوێر [ف] لاابالی در کار.

**خەمشە:** ١) گوێ‌نەدان بەکار، خۆ گێل کردن؛ ٢) شەرمی ژن [ف] ١) اِهمال؛ ٢) شرمگاه زن.

**خەمشەبیر:** تۆزو دوُکەڵی زۆر داوەستاو [ف] غُبار و دود تیره و راکد.

**خەمشەسەری:** ١) کاری بەتەمەڵی، کاری نابەدڵ؛ ٢) تەمەڵو خۆگێل‌کەر لەکار [ف] ١) انجام کار با اهمال؛ ٢) بی‌رغبت به انجامِ کار.

**خەمگین:** خەفەت‌بار، مەینەت‌بار [ف] غمگین.

**خەمل:** ١) خشڵ، زەنبەر؛ ٢) رازانەوە؛ ٣) قەرساندن، بەراوەردکردن [ف] ١) زیوَر؛ ٢) آرایش؛ ٣) برآورد کردن.

**خەمڵ:** خەمل [ف] نگا: خەمل.

**خەملان:** ١) رازانەوە؛ ٢) قەرسان، بەراورد [ف] ١) آرایش؛ ٢) ارزیابی.

**خەملاندن:** ١) رازاندنەوە بە خشڵو جلکی جوان، جوان کردن؛ ٢) قەرساندن [ف] ١) آراستن؛ ٢) برآورد کردن.

**خەملاندی:** خشڵ و جلی جوان دەبەر کراو، رازاوە [ف] آراسته.

**خەملانن:** خەملاندن [ف] نگا: خەملاندن.

**خەملاو:** ١) رازاوە، جوان‌کراو؛ ٢) بەراوردکراو [ف] ١) آراسته؛ ٢) برآورد شُده.

**خەمڵ کردن:** بەراورد کردن، قەرساندن [ف] ارزیابی کردن، تخمین زدن.

**خەملی:** جوان‌کراو، رازاوە [ف] آراسته.

**خەملین:** خەملان [ف] نگا: خەملان.

**خەملێن:** ١) رازێنەوە، جوانکەر؛ ٢) قەرسێن، بەراوردکەر [ف] ١) آرایشگر؛ ٢) براوردکُننده.

**خەملینۆك:** رازێنەوە [ف] آرایشگر.

**خەملیو:** خەملاو [ف] نگا: خەملاو.

**خەمناك:** خەمبار [ف] غمناك.

**خەمو:** ١) بەخەم بۆ هەموکەس؛ ٢) ناوەبۆ پیاوان [ف] ١) شریك غم دیگران؛ ٢) اسم مردانه.

**خەموُر:** پەزی دەم‌وچاو سپی‌و رەش [ف] گوسفند رخسار سپید و سیاه.

**خەمۆش:** بێدەنگ، وُسکوت [ف] خاموش، ساکت.

**خەمە:** خەمۆ [ف] نگا: خەمۆ.

**خەمەخۆره:** شاهۆ، خەمخۆره، شاوەشینکە [ف] بوتیمار.

**خەمەگرو:** خم‌خموك، قم‌قموك، سەرمازەلە [ف] وزغ.

**خەمیر:** هەویر، ئاردی لە ئاوکراوی شێلدراو بۆ نان [ف] خمیر.

**خەمین:** مەینەت‌بار، دڵ‌تەنگ [ف] غمگین.

**خەن:** ١) گەردن، مل، ئەستۆ، ئەوك؛ ٢) کەن، پێکەنین، کەنین، خەنە [ف] ١) گردن؛ ٢) خنده.

**خەنازیر:** کوانی زل کە لە مل دێن [ف] خنازیر.

**خەنازیل:** خەنازیر [ف] خنازیر.

**خەنان:** پشکوتو، بشکفتی [ف] شکفته، بازشُده.

**خەناوك:** گەردن‌بەند، ملیوانە، ملوانە، ملوانکە، گەردانە [ف] گردن‌بند.

**خەناوکە:** خەناوك [ف] گردن‌بند.

**خەنجوك:** خەنجەر [ف] خنجر.

**خەنجەر:** کێردی درێژی خواری دەسكدار کە پیاوان دەبەر خۆیانی ڕادەکەن [ف] خنجر.

**خەنجەربازی:** گەمە بەخەنجەر کردن [ف] خنجر بازی.

**خەنجەربالە:** کەندەسمە، مێش خۆره، مەلێکە باڵی لەخەنجەر ئەکا [ف] پرنده‌ای با بالهائی شبیه به خنجر.

**خەنجەر دەم:** دارکوتە، دارتەقێنە [ف] دارکوب.

**خەنجەردەمە:** خەنجەردەم [ف] دارکوب.

**خەنجەرە:** گیایەکە وەك فاسولیادەچێ کە لوی هەیە [ف] گیاهی است.

**خەنجەرەدمە:** جۆرێ کولە، جسنە کللۆیەکە کلکی خوارو درێژە [ف] نوعی مَلَخ دم‌بُلند و کج.

**خەنجەلیس:** گیایەکە بنەکەی دەخۆن [ف] گیاهی است که پیازه‌اش را

می‌خورند.

**خەنجێر:** خەنجەر [ف] خنجر.

**خەند:** قەن، قەند، شەکری تۆڵا بەستوُ [ف] قند.

**خەندخەندوك:** کۆکەڕەشە، خروزەك [ف] خروسَك.

**خەندقان:** خنکان، پشو لێبڕان، هەناسە نەمان [ف] خفەشُدن.

**خەندقاندن:** خنکاندن، پشولێبڕین [ف] خفه کردن.

**خەندقین:** خەندقان [ف] خفەشدن.

**خەندۆر:** خەرەند [ف] نگا: خەرەند.

**خەندەران:** دەم بە پێکەنین و روخۆش [ف] همواره شاد و خندان.

**خەندەق:** خەرەند، کەندالّی هەڵکەندراو [ف] خندق.

**خەندەق دانەوە:** هەڵکەندنی خەندەك [ف] کندن خندق.

**خەندەك:** خەندەق [ف] خندق.

**خەندەك دانەوە:** خەندەق دانەوە [ف] کندن خندق.

**خەنزار:** ئابڕوتکاو، شەرم‌نەماو [ف] رسوا.

**خەنزاری:** بەشوُرەیی، بێ‌ئابڕویی [ف] رسوایی.

**خەنزراندن:** هەڵکزاندنی موی سەروپێ [ف] موی کلّه‌پاچه را بر آتش گرفتن.

**خەنزرین:** خەزرین [ف] نگا: خەزرین.

**خـەنـۆك:** ۱) تاژی پیر کە ئاگاتە کە روێشك؛ ۲) گوێ نەدەر بە کار [ف] ۱) تازی پیر که به شکار نرسد؛ ۲) اِهمال کار.

**خەنۆل:** خەندەران [ف] بشّاش و خندان.

**خەنە:** ۱) کەن، پێ‌کەنین، خەنین؛ ۲) گیای رەنگی دەست و پێ و سەری ژنان [ف] ۱) خنده؛ ۲) حَنا.

**خەنـەبـەنـدان:** کۆبوُنەوەی شەوی پێش بوُك بردن. کە خەنە دەگرنە دەستی *بوُك و کیژان* [ف] مراسم شب قبل از عروسی.

**خەنەتیفك:** کرێژەبەرد [ف] گُل سنگ.

**خەنەران:** خەندەران [ف] همواره خندان.

**خـەنـەك:** ۱) خەنـدەك، خەرەنـد؛ ۲) خەنـۆك [ف] ۱) خندق؛ ۲) نگا: خەنۆك.

**خەنەکچان:** بریتی لە دامێن پاکی، بێ گوناحی [ف] کنایه از: پاك دامنی.

**خەنـەڵ:** بزنی شان‌وپیل بەرەنگی خەنـە [ف] بزی که موهـای شانه‌اش حنایی باشد.

**خەنی:** ۱) بەئارەزو گەیشتو، کامڕەوا؛ ۲) پێکەنی، کەنی [ف] ۱) کامران، کامیاب؛ ۲) خندید.

**خـەنـیـم:** ۱) دوژمن؛ ۲) دۆستـی فاسقی ژنی کەسێك [ف] ۱) دشمن؛ ۲) معشوق زن شوهردار.

**خـەنیـکە:** ۱) قایشی نیر؛ ۲) شێـوی شلەساواری ورد [ف] ۱) یوغ‌بند؛ ۲) آش بلغور ریز.

**خەنیلە:** پیرخەنیلە، چێشتی وردەساواری تراو [ف] آش بلغور ریز.

**خەنین:** کەن، کەنین، پێخەنین [ف] خندیدن.

**خەنینەوە:** تریقانەوە، پێکەنینی بەقەو [ف] خنده با صدای بُلند.

**خەو:** ۱) نوستن، دژی بێداری؛ ۲) خەون، شتێ کە لە خەوا دەبینرێ [ف] ۱) خواب؛ ۲) رؤیا.

**خەواتەمار:** خەوی زۆر گران [ف] خواب بسیار سنگین.

**خەوار:** ۱) کەسێ زۆر دەخەوێ، ئەوی زیاد دەنوێ؛ ۲) تەنبەڵ، تەمەڵ [ف] ۱) پرخواب؛ ۲) تَنبل.

**خەوارە:** هۆزێکی کوردە لە کوردستان [ف] عشیره‌ای کرد.

**خەواڵو:** چاو بەخەو، کەسێ لەخەو هەستابێ بەڵام خەو بەری نەدابێ [ف] خواب‌آلوده.

**خەواندن:** ۱) نواندن، دەخەوکردن، خەفاندن؛ ۲) نەواندن، چەماندن [ف] ۱) در خواب کردن؛ ۲) بر زمین خوابانیدن.

**خەوبردن:** لەخەو کردن، خەولێ ساندن [ف] از خواب محروم کردن.

**خەوبـردنـەوە:** دەخەو ڕاچون، خەولێ کەوتن، بەرانبەری بێدارمان [ف] بەخواب رفتن.

**خەو بەسەرچوُن:** لەخەواڵویی قوتاربون [ف] از خواب‌آلودگی رستن.

**خەوبینین:** خەو دیتن، لەخەودا دیتنی شت [ف] خواب دیدن.

**خەوپەڕین:** خەو بەسەر چوُن، نەمانی خەواڵویی [ف] خواب از چشم پریدن.

**خەوپەڕێن:** کارێ یان شتێ کە داهێزانی خەو ناهێڵێ [ف] از بین برندهٔ خواب.

**خـەوتـن:** ۱) نوستن، چوُنـەخەو، رازان؛ ۲) درێژبوُن، خۆلەگەزدان [ف] ۱) خفتن؛ ۲) دراز کشیدن.

**خەوتنان:** ماوەیەك دوای نوێژی شیوان، شەو کاتی خەوتن [ف] عِشاء.

**خەوتوُ:** خەفتگ، نقْستی [ف] خوابیده.

**خەوتە:** خەوخەو، خەوخۆش [ف] خوش‌خواب.

**خەوتەقین:** خەوزڕان، خەوپەڕین [ف] خواب پریدن.

**خەوْخان:** وەرەزو سـست بون [ف] سـست شدن.

**خەو خۆش:** خەوگران، خۆش‌خەو [ف] گران‌خواب.

**خەوخەو:** کەسێ زۆر دەخەوێ [ف] کسی که زیاد می‌خوابد.

**خەوداگرتن:** خەو بەسەردا هاتن، هێرش هێنانی خەو [ف] سخت خواب گرفتن.

**خەودیتن:** رابردەی دەمی نوستن [ف] خواب دیدن.

**خەور:** ۱) لێڵایی؛ ۲) دنیای بەتەم‌و مژ؛ ۳) ژەنگی تەنکی سەر ئاوێنە [ف] ۱) کدر؛ ۲) فضای مه‌آلود؛ ۳) زنگار آینه.

**خەو روژْك:** بەسەرهاتی بە درۆ گێڕانەوە [ف] تعریف سرگذشت دروغین.

**خەوڕەوین:** خەوپەڕین، خەوتەقین [ف] خواب‌پریدن.

**خەوڕەوێن:** خەوپەڕێن [ف] سبب پریدن خواب.

**خەو زڕان:** خەوپەڕین، لەخەو بێ‌بەش بوُن [ف] بی‌خواب شدن.

**خەو زڕین:** خەوزڕان [ف] بی‌خواب شدن.

**خەوزڕێن:** خەوپەڕێن [ف] سبب پریدن خواب.

**خەوسوُك:** لەخەوا لەسەرهەست، بەرانبەری خەوگران [ف] سبك خواب.

**خـەوش:** ۱) عەیـب، کەمایەسی، خـەش: (وەك زێڕی بێ‌خەوش وایە)؛ ۲) دەنکی چروُك و بێگـانـە لەنـاو دەغڵ‌دا؛ ۳) خشڵ، زەنبەر [ف] ۱) دَغَل؛ ۲) دانه‌های ناباب در غلّه؛ ۳) زیوَر.

**خەوشێ:** ناوە بۆژنان ف نام زنانه.

**خەوقورس:** خەوگران، بەرانبەری خەوسوك ف سنگین‌خواب.

**خەوگا:** جێ‌خەو ف خوابگاه.

**خەوگران:** خەرخۆش، کەسێ کەدێر لەخەو هەڵدەستێ ف گران‌خواب.

**خەوگرتن:** ١) خەو داگرتن؛ ٢) خەو لێ‌ساندن، بێ‌بەش کردن لە نوستن ف ١) سخت خواب گرفتن؛ ٢) از خواب محروم کردن.

**خەول:** گلار، گل، تل، خلۆر ف غلت، تلو.

**خەولان:** گلاربوونەوە، خلۆربوونەوە، تل‌خواردن ف غلتیدن.

**خەولاندن:** تلۆر کردنەوە ف غلتانیدن، غلت‌دادن.

**خەولێ:** زەحف، زاف، فریە، گەلەك، خەیلێ، فرە ف بسیار، خیلی.

**خەولێ کەوتن:** دەخەو ڕاچوون، نقستن، چاوچوونە خەو ف بەخواب رفتن.

**خەومەت:** خزمەت، کاربۆکردن ف خدمت.

**خەون:** شتانێ کە لە خەوا دەبینرێن ف رؤیا.

**خەونامە:** کتێبی خەون لێکدانەوە ف کتاب تعبیر خواب.

**خەون دیتن:** دیتنی شتان لە خەودا ف خواب دیدن.

**خەونوچکە:** وێژنگ، وێژینگ، وەنەوز ف پینکی.

**خەونی ئاڵۆز:** خەوی بێ‌سەروبەر، پەرێشان ف خواب پریشان.

**خەووك:** ١) خەوخەو، کەسێ کە هەمیشە کەیفی لە خەوتنە؛ ٢) گایەك کە لەکاتی کاردا دەخەوێ، خەفۆك ف ١) همیشه آرزومند خواب؛ ٢) گاوی که هنگام شخم‌زنی بخوابد.

**خەوهاتن:** ئیشتیا لە نوستن بوون ف خواب‌آمدن.

**خەوە کوتکێ:** خەوەنوچکە ف پینکی.

**خەوەنوچکە:** خەونوچکە ف پینکی.

**خەی:** ١) وشەی خۆشەویستی، گیانە؛ ٢) وشەی هانەدان: (**خەی** ئەم‌کارە بکە)؛ ٣) چەند خۆشە، ئۆخەی؛ ٤) ئافەریم ف ١) کلمهٔ دوست‌داشتن؛ ٢) کلمهٔ تشجیع؛ ٣) چه خوش است؛ ٤) آفرین.

**خەیات:** جل‌دور، بەرگ‌دور ف خیّاط.

**خەیاتە:** ١) گشتەکی ئاوریشم: (زولفت **خەیاتە**ی خاوە)؛ ٢) سوورەساقە، زەرنەقوتە، بەچکە مەلیچکی توك لێ‌نەهاتگ ف ١) نخ تاب‌دادهٔ ابریشمی؛ ٢) جوجه گنجشك پر درنیاورده.

**خەیاتە کێش:** دەرزی تایبەتی بۆ خەیاتە ف نوعی سوزن ویژهٔ نخ‌تاب دادهٔ ابریشمی.

**خەیاتی:** پیشەی جل‌دور ف خیّاطی.

**خەیار:** هاروێ، ئارو، ئاروێ ف خیار.

**خەیارچەمبەر:** بەری گیایەکە بۆدەرمان دەشێ ف از گیاهان داروئی.

**خەیارچەمەر:** خەیار چەمبەر ف از گیاهان داروئی.

**خەیار دێمی:** گوژاڵك ف هندوانهٔ ابوجهل.

**خەیارشنگ:** خەیار چەمەر ف از گیاهان داروئی.

**خەیاروك:** قوونێر، جۆرێ کوانە کە زۆرتر لەقون و لا ان دێت ف نوعی دُمَل.

**خەیارە:** خەیاروك ف نوعی دُمَل.

**خەیارەك:** خەیاروك ف نوعی دُمَل.

**خەیاڵ:** ١) فکر، بیر، هزر؛ ٢) شتی نەشیاو ف ١) فکر؛ ٢) محال.

**خەیاڵات:** ١) بیر و هزری زۆر؛ ٢) دەبیرەوە چوون؛ ٣) فکری دوور و نەشیاو ف ١) افکار زیاد؛ ٢) در فکر فرورفتن؛ ٣) امر محال و ناممکن.

**خەیاڵی:** شتێ کە نەبوەو بەخەیاڵ دروست کراوە: (ئەم چیرۆکە **خەیاڵیە**) ف خیالی، افسانه.

**خەیان:** غدیان، بەرواڵەت دۆستی ناڕاست ف خائن.

**خەیانن:** خایاندن، ماوەبردن ف گذشت زمان.

**خەیانەت:** ناڕاستی لە دۆستی‌دا، غەدر، غەیانی ف خیانت.

**خەیب:** پیوار، نادیار ف غیب.

**خەیبی:** نادیاری، بەرپیوار، نەلەبەرچاو ف غیبی.

**خەید:** ١) توورەیی، رك، رق؛ ٢) دەی‌خا، ئەی‌خات ف ١) خشم؛ ٢) می اندازد.

**خەیدۆك:** هەمیشە توڕەو ڕك هەستاو ف همیشه عصبانی.

**خەیدی:** توڕە، رك‌هەستاو، قەڵس ف خشمگین.

**خەیدین:** توڕەبوون، قەڵس‌بوون، رق‌هەستان ف خشمگین شُدن.

**خەیر:** ١) جگە، بێجگە؛ ٢) نە، نا، نەخێر ف ١) جُز؛ ٢) خیر، نه.

**خەین:** جگە، بێجگە، بەجگە، جیالە ف بجُز.

**خەیوور:** بەناموس، ناموس پارێز ف غیرتمند، غیور.

**خەیویر:** هەویر، خەمیر ف خمیر.

**خی:** خەریك‌بوون، مژولی ف سرگرمی، اشتغال.

**خێ:** ١) هەشتەم پیتی ئەلف‌و بێتکە؛ ٢) خوێ، خوا، نمەك؛ ٣) نەریت، خوو؛ ٤) فێ، نەخۆشی خوداری؛ ٥) ئارەقەی لەش، خوە ف ١) حرف «ح» در الفبا؛ ٢) نمك؛ ٣) خوی و روش؛ ٤) بیماری صرع؛ ٥) عَرَق بدن.

**خیا:** یخ‌دانی وشتر: (هیشترێ **خیا** بکە) ف بر زانو نشاندن شتر..

**خێ‌بەندان:** خوێڵێن، جێگەی خوێ لەدەم زەریا ف نمکزار.

**خیپ:** ١) کەل‌و پەلی فاڵگرەوە؛ ٢) بەردی نوك‌تیژی گەورە ف ١) ابزار رمّالی و فالبینی؛ ٢) صخرهٔ نُك‌تیز.

**خیپشنە:** کورتەباڵای قەڵەو ف کوتولهٔ چاقالو.

**خیپشە:** باوەعەمرە، چلەنۆك، باواقۆرەت ف کوتوله.

**خیپك:** فاڵگرەوە، تالح‌بین ف فالبین.

**خیت:** ١) جغز لە زەوی. بۆ سوێنددان کە *لەناویە زیدیە کاندا باوە*؛ ٢) تەریقی، خەجاڵەتی؛ ٣) خوێڕی، بێکارە ف ١) دایرهٔ بر خاك رسم شده؛ ٢) شرمندگی؛ ٣) بی‌عُرضه.

**خێت:** خەت، کێر، شوێن کێشان لەزەوی یان لە قاقەز ف کشه.

**خیتك:** وان، ئارەزو، هەوەس ف آرزو، هَوَس.

**خیچ:** ١) فرۆ، ژەکی کولاو؛ ٢) خەت لە قاقەز یان لە زەوی؛ ٣) هێڵی جووت، خەتی جووت؛ ٤) خوێل،خێل؛ ٥) لار، خوار، چەوێڵ، چەوت، چەفت؛ ٦) خوشك، خوچ، خوار؛ ٧) پووچ و پووك؛ ٨) خچ، بۆ لێخورینی ماڵاتی بەرزە ف ١) آغوز؛ ٢) کشه؛ ٣) اثر شخم‌زنی؛ ٤)

لوچ؛ ۵) کج؛ ۶) خواهر؛ ۷) پوك؛ ۸) واژه‌ای برای راندن گاو.

**خێچ:** لارو خوار، چەفت ف کج.

**خیچان:** دۆڕان له کایەدا ف باختن بازی.

**خیچاندن:** بەزاندن له کایه دا ف شکست دادن دربازی.

**خیچاو:** دۆڕاو، دەرکراو له کایەدا ف بازنده.

**خیچك:** بەردی بازەڵێن، قوچك قەمچان ف شن‌های یەقول‌دوقول.

**خێچ‌وپاچ:** قیچەڵ‌فاچ، خوارو خێچ ف کج‌وکوله.

**خێچ‌وخوار:** خێچ‌وپاچ ف کج‌وکوله.

**خێخ:** زبر، زوُر، نالوس ف زبر.

**خیخك:** شینۆك، جۆرێ قەزوانی ورد ف نوعی چاتلانقوش.

**خێدار:** فێدار، توُشی نەخۆشی فێ ف صرعی.

**خێ داری:** نەخۆشی فێداری ف بیماری صرع.

**خێر:** ١) کاری چاکه؛ ٢) گۆشتی بەخشینەوه بەسەر هەژاراندا؛ ٣) وەرامی ناقابلی، نه، نا؛ ۴) قازانجی سەودا؛ ۵) خەت؛ ۶) سوێر ف ١) مُقابل شرّ، خیر؛ ٢) گوشت خیرات؛ ٣) نه، خیر؛ ۴) سود مُعامله؛ ۵) کشه؛ ۶) شور.

**خێرا:** ١) بلەز، بەپەله؛ ٢) بەپێ، خۆش‌ڕۆ لەڕێگه؛ ٣) مەزبوُت‌و چالاك لەکار ف ١) باعجله؛ ٢) بادپا؛ ٣) چُست‌وچالاك.

**خێرات:** ئەوشتانه بەچاکه لەڕای خودا دەدرێن ف خیرات.

**خێرات خانه:** هەژارخانه، جێ بە خێو کردنی پەك کەوتان ف نوانخانه.

**خێراتن:** بەخێرهێنان، بەخێراتن ف خوشامدگویی.

**خێراقك:** سوێراو، ئاوی شۆر، کانیاوی سوێر ف آب شو

**خێراندار:** خاوەن چاکه ف صاحب احسان.

**خێراو:** ئاوی ساردی خواردنەوه بە بەلاش ف آب سردِ خیریه.

**خێرایی:** مەزبوُتی، گورج‌و گۆڵی، بەگورجی ف چستی، چالاکی.

**خێرته:** ١) بەیاری قەت نه کێڵدراو؛ ٢) ناوی گوندێکه له کوردستان ف ١) زمینی که هیچ وقت کاشته نشده باشد؛ ٢) نام روستایی است.

**خێرخوا:** چاکەکار ف خیرخواه.

**خێرخواز:** خێرخوا، چاکەکار ف خیرخواه.

**خێرخێر:** ڕێ‌ڕێ، قوماشی خەت‌خەت ف پارچهٔ راه‌راه.

**خێردار:** به بەرەکەت، بەقازانج ف دارای برکت.

**خێردانەوه:** بەهرەدان‌و زەوو زوکردنی ماڵاتی کڕدراو ف سودبخشی دام خریداری شُده.

**خێردەرەوه:** ماڵێکی کڕاو که بەهره زۆر بدات ف خریده‌ای که سودبخش باشد.

**خێردیتن:** بەهره پێ گەیشتن ف سودبردن.

**خیرك:** خوره، نەخۆشیەکی پیسه ف بیماری آکله، خوره.

**خێرکار:** خێرەومەند ف نیکوکار.

**خێرکردن:** ١) بەخشین بەپیاوەتی‌و بێ قەرەبو؛ ٢) قازانج لەسەودا بردن ف ١) احسان کردن؛ ٢) سودبردن از معامله.

**خێڕو:** خوێڕی، بێکاره، خوڕی، هیچ لەدەست نەهاتگ ف بیکارهٔ بی‌ارزش.

**خێرو:** خێروك ف نگا: خێروك.

**خێروبێر:** خێر و بەرەکەت ف خیر و برکت.

**خێروك:** دەخڵێ لەتۆمی ڕژاوی پار هەڵی دابێتەوه ف غلّه‌ای که از تخم‌های پراکندهٔ سال پیش روید.

**خیره:** فاڵگرەوه، تاڵح‌بین، فاڵچی ف فالبین، رمّال.

**خێرهاتن:** بەخێراتن، خێراتن ف خوش‌آمدگوئی.

**خیرەت:** ١) ئازایی؛ ٢) پیاوەتی؛ ٣) نامُوس ف ١) شجاعت؛ ٢) مردانگی؛ ٣) ناموس.

**خێرەومەن:** چاکەکار، بەخشنده لەڕای خودا ف نیکوکار.

**خێرەومەند:** خێرەومەن ف نیکوکار.

**خێرەودەر:** خێر دەرەوه ف خریدی که سودبخش باشد.

**خێڕی:** خوێڕی، خوڕی ف بیکاره و بی‌ارزش.

**خیز:** ١) زیخ، چەو، ورکەبەرد؛ ٢) حیز، گاندەر؛ ٣) ترسەنۆك، ترسنۆك، ترسۆنەك؛ ۴) جۆرێ کڵاوی پیاوان؛ ۵) جێگەی خلیسکان ف ١) شن؛ ٢) نگا: گاندەر؛ ٣) ترسو؛ ۴) نوعی کلاه مردانه؛ ۵) جای لیز.

**خێز:** ١) زوُرك، دەشتی بەکەندو بڵندایی، زەوی بەگردولکەو قوُڵکه؛ ٢) خشڵ‌و زەنیەر؛ ٣) توڕاو، زیز، زوُیر؛ ۴) توڕان، ڕەنجان، زیزبوُن؛ ۵) هێڵ، خەت، کێڕ؛ ۶) خۆشاندان: (خالان خێزیان کرد) ف ١) تپّه‌ماهور؛ ٢) زیور؛ ٣) رنجیده؛ ۴) رنجش؛ ۵) کشه؛ ۶) نمایان شدن، آشکارگشتن.

**خیزار:** گردەبڕ، شەقەمشار، هەڕەی زەلامی دوکەسی ف ارّهٔ دونفره.

**خیزاف:** زوُخاو، کێم‌و خوێنی برین ف ریم‌و خونِ زخم و دُمَل.

**خیزان:** خیزاف ف ریم و خونِ زخم و دُمَل.

**خێزان:** ١) ماڵ‌و منال؛ ٢) نانخۆری ماڵ؛ ٣) کەیوانو، ژن بۆ مێرد؛ ۴) هەژارو نەدار؛ ۵) حەکیمی فێداران ف ١) زن و بچّه؛ ٢) افراد خانواده؛ ٣) زن نسبت به شوهرش؛ ۴) فقیر؛ ۵) طبیب بیماری صرع.

**خێزاندار:** خاوەنی نانخۆری زۆر ف عیالوار.

**خێزاو:** ١) هەڵکشانی ئاوی چەم‌و دەریا بەهۆی مانگەوه؛ ٢) شەپۆلی چکۆڵەی چەم ف ١) مدّ دریا و رودخانه؛ ٢) موج کوچك.

**خیزخۆر:** بەستێن، گوێ چەم که لافاوی لەسەر کشاوەتەوه ف کنار رودخانه که سیل از آن فروکش کرده.

**خیزْك:** جەغز، جغز ف دایره.

**خیزه:** ١) خیگه، هیزه، پێستەی ڕۆن‌تێکردن؛ ٢) نیخه، دەنگ لەسنگەوه هاتنی نەخۆش ف ١) خیك؛ ٢) خش‌خش نفس بیمار.

**خیزەر:** لکی‌تازه دەرچوی دار ف شاخهٔ تازه برآمدهٔ درخت.

**خیزەره:** هەڵاش، چرپی‌و پوشی سەرداره‌ڕاو ژێر قوڕەبان ف انبیره.

**خێزەره:** بەشوێن یەکتردا هاتنی زیندوی لەش: (ئەسپێ خێزەرەی بەستبو) ف ا[illegible]هی حشرات بر تن آدمی.

**خیزەلان:** شوێنێ که زیخ‌و چەوی زۆره ف شنزار.

**خێزیان:** ١) هەستان، ڕاستەوەبوُن لەبەر یەکێك، ئاخێز کردن، ڕابوُن؛ ٢) هەراش‌بوُن، بالاکردن ف ١) برخاستن؛ ٢) نمو کردن.

**خیس:** ۱) روگرژ، روناخۆش؛ ۲) نیخەنیخ [ف] ۱) ترش‌رو؛ ۲) خِش‌خِش سینه.

**خێس:** ۱) دەمو لەوس خوار؛ ۲) مل خوار [ف] ۱) کج دهان؛ ۲) گردن کج.

**خیسار:** خوُس، خوسار، زوقم [ف] پژ، سرماریزه.

**خیسکە:** پیازی وردی چاندن [ف] پیاز کاشتنی.

**خێسە:** ۱) بەگۆشەی چاو ڕوانین بەتوُڕەیی؛ ۲) ئاوڕدانەوە هەر بەمل [ف] ۱) چشم آغیل؛ ۲) سر برگردانیدن.

**خیسەخیس:** نیخەنیخ، خڕخڕی سینە [ف] خِش‌خِش سینه.

**خیسەڵان:** خلیسك، شوُناشەمتین [ف] لیزگاه.

**خێش:** ۱) شەنـەی دەم بەقـولاپ کەشـتی گرانی لەلای سەرەوەپێ دادەگـرن؛ ۲) راکـێـش، بەزەویداکشـان؛ ۳) وە درەنـگ کەوتن [ف] ۱) چنگك مخصوص پائین آوردن جسم سنگین؛ ۲) بر زمین کشیده شدن؛ ۴) دیر شُدن.

**خێشاندن:** وە درەنگ خستن، تەمەڵی کردن [ف] اهمال کردن.

**خێشك:** تەختەی ڕێك‌و لوُس کردنی شێوەرد [ف] مالهٔ صاف کردن شُخم، هبد.

**خیش کردن:** پیش خواردنەوە [ف] از شدت خشم لب فروبستن.

**خێش کردن:** بەسەر زەویدا راکێشان [ف] بر زمین کشیدن.

**خێشکە:** لەسەرقنگ خزین [ف] بر باسن حرکت کردن.

**خیشەخیش:** هەناسە سواری [ف] نفس‌نفس زدن.

**خێشەخێش:** بەنهێم کشان بەسەر زەویدا [ف] کشان‌کشان.

**خیشی:** خەشە، جەواڵی لەمو [ف] جوال از کُرك بافته.

**خیف:** ۱) باڵاکردن، هەراش بوُن؛ ۲) نۆبەرە، باڵاتە؛ ۳) شتی نادیاری؛ ۴) تاڵە [ف] ۱) رشد، بالندگی؛ ۲) نوبَر؛ ۳) غیب، ناپیدا؛ ۴) طالع.

**خیفزان:** فاڵچی، تالح‌بین [ف] فالبین.

**خیفە:** نۆبەرە، خیف [ف] نوبَر.

**خیڤ:** ۱) بیرتیژی بلیمەت؛ ۲) حیساب [ف] ۱) باهوش؛ ۲) حساب.

**خیڤزان:** حسابگەر [ف] حسابگر.

**خیڤك:** بێهۆش و گێلۆکە [ف] هالوی فراموشکار.

**خیڤە:** خیفە، خیف، باڵاتە، نۆبەرە [ف] نوبَر.

**خیگ:** ۱) هیزە، خیزە، پێستەی ڕۆن؛ ۲) بەراز، وەراز، خوُ [ف] ۱) خیگ؛ ۲) خوك.

**خیگۆلکە:** ۱) کودەڵە، بەچکەوەراز؛ ۲) هیزەی پچوك [ف] ۱) بچّه خوك؛ ۲) خیگ کوچك.

**خیگە:** هیزە، خیزە، پێستە بوڕۆن [ف] خیگ.

**خیگەڵە:** خیگۆلکە [ف] نگا. خیگۆلکە.

**خێل:** چاوخوار، خوێل [ف] لوچ.

**خێڵ:** کۆمەڵی هەوارچی؛ ۲) هۆز [ف] ۱) گروه چادرنشین؛ ۲) عشیرت.

**خێڵات:** خێڵی زۆر، رەوەند [ف] ایلات.

**خیـلاف:** ۱) درۆ، ناڕاسـت؛ ۲) کێشەو نێـوان ناخۆشی [ف] ۱) دروغ؛ ۲) مُخالفت.

**خیلانـگ:** درکێکە بۆ ئاگر کردنەوەی دەبەن [ف] خاری است که برای سوزاندن مورد استفاده دارد.

**خیلتان:** ئەو گیایەی ددان ئاژنی لێ دەکار دەکەن [ف] گیاهی است که از آن خلال دندان می‌سازند.

**خیلۆنگ:** خیلانگ [ف] نگا: خیلانگ.

**خێلی:** ۱) ڕوُبەند، پەچە، پوُشی، ڕوپۆش؛ ۲) سێبەرو تەم؛ ۳) نەخۆشی چاوخـواری؛ ۴) تارای بوُك [ف] ۱) روبـنـد؛ ۲) سایه و مه؛ ۳) چشم‌چپی؛ ۴) پارچهٔ قرمزی که روی صورت عروس می‌کشند.

**خیـم:** ۱) بنـاغە، هیـم، بنچینەی خـانو؛ ۲) گـوڵمیخی لەدار، سنگ؛ ۳) رەچـەڵـەك، بنیچە، تۆرەمە، نەژاد، رەگەز [ف] ۱) اساس؛ ۲) میخ بزرگ چوبی؛ ۳) نژاد، اصل.

**خێم:** سەربەرە زێری، سەرنشیو [ف] سر بزیر.

**خین:** خوێن، خوُن، هوُن [ف] خون.

**خێن:** ۱) خین؛ ۲) پاشگری بەواتا: خوێندەوارو خوێندن: (دەرس خێن، رەش‌خێن)؛ ۳) جگە، بێجگە [ف] ۱) خون؛ ۲) پسوند بەمعنی خواندن و خواننده؛ ۳) بجُز.

**خینالی:** خوێناوی [ف] خون‌آلود.

**خێنج:** جگە، بل، غەیر [ف] بەغیراز، بەجز.

**خیندار:** خوێنەخۆ، دژمنی خوێنی [ف] دشمن‌خونی.

**خێنژ:** جگە، جیالە، غەیرەز [ف] بجُز.

**خێنگ:** خوشك، خویشك، خوار [ف] خواهر.

**خینگر:** خەنجەر [ف] خنجر.

**خینگە:** تەنگە ئەستور [ف] شکم گنده.

**خینی:** خیندار [ف] دشمن خونی.

**خێنی:** خانو، ماڵ [ف] خانه، سرا.

**خێو:** ۱) خاوەن، ساحیب؛ ۲) خودای کانی‌و ئاواں، جنۆکە؛ ۳) راهێنان و ژیاندن [ف] ۱) صاحب؛ ۲) رب‌النوع، جِن؛ ۳) پرورش کردن.

**خێوانە:** بەرکوت، گەنمێ کە بەرلە هەڕەتی دروێنە دەیدرون‌و گێرە دەکرێ بۆ خواردن [ف] پیشکوب غلّه.

**خێور:** خەرەف [ف] خَرَف.

**خێوران:** توانەوە. *بۆ تاواندنەوەی خۆراکی دەیڵێن* [ف] ذوب شدن. *برای خوراکی گویند*.

**خێۆلکە:** هیزەی پچوك، خیگەی چکۆلە [ف] خیگ کوچك.

**خێوەت:** چادر، خەیمە، کۆن [ف] خیمه.

**خیوە:** نوبەرە، باڵاتە [ف] نوبَر.

**خێوەند:** خاوەن، خودان، خێو، ساحەب [ف] صاحب.

**دْ:** *له پێش وشـەوە دێت بەمـانای :* ١) دە، ئە، نیشانەی کردەی ئێستەو ئایەنـدە: (**دْ**چم، **دْ**بێم)؛ ٢) پێشگـری دنـەدان، هان‌دان: (**دْ**هـەڕە)؛ ٣) پێشگری دواندن بە توڕەیی: (**دْ**دەڤ ژمن بەردە؛ ٤) جارجار زێدە لە پێویست دێت: (**دْ**دو : دو، یەك‌و یەك) [ف] ١) *بەعنـوان پیشـونـد بەمعـانی :* ١) فعـل مضـارع؛ ٢) تشـویق و تشجیع؛ ٣) خطابِ عتاب‌آمیز؛ ٤) گاهی بدون داشتن معنی مستقل.

**دا:** *لەپێش وشە بەمانای :* ١) بەرەخوار: (**دا**کەوتن، **دا**هێنان، **دا**هێشتن)؛ ٢) نوێ، تازە: (هەوایەك **دا**هاتوە مامڵێ دەیڵێ)؛ ٣) هەتا، هەیا: (**دا** بۆ خۆم دێم هیچ مەکـە)؛ ٤) دەبـا، بڵا: (**دا**بـزانـم چیە)؛ ٥) مات، سەرگەردان: (**دا**مـابـوم)؛ ٦) ئەی، هۆی: (**دا** کاك‌پیرۆت وەرە)؛ ٧) مەکە، وامەکە: (**دا**دەنگ با گوێمان لێ بێ)؛ ٨) پێشگری خواستن: (**دا**بمـدەیە، **دا**وەرە)؛ ٩) وشـەی هان‌دان: (**دا**دەی ڕامـەوەستن)؛ ١٠) وشـەی ڕێز لێ‌نان کچی شو نەکـردو: (**دا**مـریەم)؛ ١١) بەواتا: بەخشی: (نـانی **دا**بـەمن)؛ ١٢) عیلاجی نەخۆشین: (خەریکی **دا**و دەرمانم)؛ ١٣) هاوارو شکایەت: (**دا** لەدەست ئاغای زاڵم)؛ *لەپاش وشە بەمانای :* ١٤) لێدان: (لەمنی **دا**)؛ ١٥) دەفرایەتی: (ئەم جەواڵە چی‌تێ **دا**، پارە ها لە کیسە**دا**)؛ ١٦) بەمانای دایك، دێ [ف] *پیشوند بەمعنی :* ١) فرو، فرود؛ ٢) نو، تازە؛ ٣) تا؛ ٤) بگُذار؛ ٥) سرگردان؛ ٦) آهای؛ ٧) نکُن؛ ٨) خواستن و تقاضا کردن؛ ٩) حرف تشویق و تشجیع؛ ١٠) کلمـۀ احتـرام به دوشیزگان؛ ١١) بەمعنی بخشیدن؛ ١٢) مداوا، معالجە؛ ١٣) داد و شکایت؛ *پسوند بەمعانی :* ١٤) زدن، مضروب کردن؛ ١٥) ظرفیّت؛ ١٦) مُستقل به معنی مادر.

**دائەنێم:** واحەساوئەکەم [ف] چنین فکر می کنم.

**دائیخستن:** کردنەباو [ف] متداول کردن.

**دائینـان:** ١) ڕۆهێشتن؛ ٢) لەنـەبـوُچێ کردن؛ ٣) بەمشـار بڕینـەوە؛ ٤) نەوی کردنی لکی‌دار؛ ٥) دەست پێداماڵین [ف] ١) فرو هشتن؛ ٢) ابداع کردن؛ ٣) با ارّە بریدن؛ ٤) کوتاە کردن شاخۀ درخت؛ ٥) دست بر چیزی مالیدن.

**داب:** ١) عادەت، نەریت، دام‌و دەستـور؛ ٢) هوندراو لە داوموُسك [ف] ١) عادت، رسم؛ ٢) تنیده ازِ موی دُم اسب.

**دابا:** ئەگەر خۆی داهینابا‌وە [ف] اگر خم می‌شد.

**دابارا:** لەسەرڕا هاتەخوار: (میوە **دابارا**) [ف] فروریخت.

**داباران:** ١) بەرەوخوار هەڵڕژان؛ ٢) لە هەمولاوە بۆهاتن: (هەرگوتم ترێ مشتەری **داباران**) [ف] ١) فروریختن؛ ٢) گردآمدن بر چیزی.

**داباراندن:** هەڵڕژاندن لەسەرەوە بۆخوار [ف] فروریختن.

**دابارانن:** داباراندن [ف] فروریختن.

**دابارین:** داباران [ف] نگا: داباران.

**دابارێن:** کەسێ کە بەرەوخوار هەڵدەڕێژێ [ف] فروریزنده.

**داباش:** بەشوێندا گەڕان، لێکوڵینەوە، تۆژینەوە [ف] پژوهش، جستجو.

**دابڕ:** کەرت، کەر، لەت، پارچە: (مەڕەکە **دابڕدابڕ**بو) [ف] قطعه‌قطعه.

**دابڕان:** لەت‌بوُن، لێك‌جیابوُن [ف] از هم جداشدن.

**دابڕانێ:** ملە، کێ‌بەرکێ لە گوریس کێشاندا [ف] مسابقۀ طناب‌کشی.

**دابڕستن:** شاڵاوبردن [ف] حمله‌بُردن.

**دابڕسکان:** پەلاماربردن بۆ ڕفاندن [ف] هجوم بەقصد ربودن.

**دابڕسکین:** دابڕسکان [ف] هجوم به قصد ربودن چیزی.

**دابـڕکـردن:** ١) جیاکـردنەوەی کەم لە زۆر؛ ٢) بەزۆر گرتن‌و بردن [ف] ١) جدا کردن جزء از کُل؛ ٢) اشغال کردن.

**دابڕین:** ١) دابڕکردن؛ ٢) بریندار‌بوُن بەهۆی توندبوُنی بەن لە ئەندام؛ ٣) لەلـەکردنی دار بەچەقۆ [ف] ١) جدا کردن جزء از کُل؛ ٢) زخمی شدن توسط طناب یا ریسمان؛ ٣) اثر گذاشتن بر چوب با کارد.

**دابنارتن:** چە قاندنی ریشەو نە مام [ف] کاشتن ریشه و نهال.

**دابو:** هاتە سەردەستان، خۆی چەماندەوە [ف] خم شُد.

**دابوُن:** چەمینەوەیەکە دەست بگاتە سەرزەمین [ف] خم شُدن و دست بر زمین نهادن.

**دابە:** ١) بچەمێوە، کۆم‌بوەرەو؛ ٢) عادەت وایە، ڕێ‌وشوێنە [ف] ١) خم شو؛ ٢) عادت چنین است.

**دابەڕزان:** هەڵمەت، هێرشی توند [ف] هجوم سریع.

**دابەڕزاندن:** هەڵمەت بردن بەرلە هەواڵان [ف] قبل از بقیه یورش بردن.

**دابەڕزین:** دابەڕزان [ف] یورش.

**دابەز:** بەرەوژێر داپەڕین: (ئەم هەڵبەز **دابەز**ەت لەچیە؟) [ف] پایین پریدن.

**دابەزین:** لەسەر سواری هاتنەخوار [ف] پیادە شُدن.

**دابەزێن:** ئەوی سواران دێنێتەخوار [ف] پیادەکُننده.

**دابەستن:** ۱) قایم کردن، شەدانـدن، شەتەكدان؛ ۲) قامەت بەستن، دەست پێکـردنی ـنوێژو نیەت: (نیەتی **دابەست**، نوێژی **دابەست**)؛ ۳) حەیوان لەمـاڵ راگرتن بۆ قەڵـەو بوُن؛ ۴) نیر و ئامـور سەرملی گاخستن‌و ئامـادەی جوُت بوُن: (جوتەکەم **دابەست**) [ف] ۱) محکم بستن؛ ۲) اقـامهٔ نماز کردن؛ ۳) نگهداری حیوان و فربه کردن آن؛ ۴) مُهیّا کردن ابزار شُخم.

**دابەستە:** حەیوانی لەماڵ راگیراو بۆ قەڵەو بوُن [ف] حیوان پرواری.

**دابەش:** بەش کردن، بەش بەش کردن [ف] تقسیم.

**دابەش دابەش:** پارچەپارچە، جیاجیا [ف] شرحەشرحە.

**دابەش بوُن:** جویَ جویَ‌و بەش بەش بوُن [ف] قطعەقطعەشُدن.

**دابەش کراو:** پارچەپارچە کراو [ف] شرحەشرحە شُده.

**دابەش کردن:** بەش کردن [ف] تقسیم کردن.

**دابەش کەر:** کەسێ کەشتێ بەش بەش دەکا [ف] توزیع کننده.

**دابەشین:** دابەش کردن [ف] توزیع.

**دابەشینەوە:** دابەشین [ف] توزیع.

**دابەلاندن:** قوت‌دان، قویت‌دان [ف] بلعیدن، فروادن.

**دابەلین:** دابەلاندن [ف] نگا: دابەلاندن.

**دابێژ:** دابێژەر، کەسێ کەئارد یان دەخڵ بەهێڵەگ قەلبیردا دەکا [ف] بیزنده.

**دابێژان:** بێژتن [ف] بیختن.

**دابێژتن:** بێژتن [ف] بیختن.

**دابێژدابێژ:** کون‌کون وەك بێژنگ [ف] سوراخ سوراخ.

**دابێژراو:** بەبێژنگ بێژراو [ف] بیخته.

**دابێژە:** فرمان بە دابێژتن: (ئارد **دابێژە** بوُنان) [ف] بیخته کُن.

**دابێژتن:** بێژتن [ف] بیختن.

**دابین:** ۱) خوٚمـان بچـەمێنین؛ ۲) توٚقـرەگرتو، هێدی، داسەکنان، کار پێك‌هاتـو؛ ۳) خاترجەم؛ ۴) ئارام، بێ‌کێشە [ف] ۱) خود را خم کنیم؛ ۲) آرام، قرار؛ ۳) خاطرجمع؛ ۴) اَمن و امان.

**دابین کردن:** پێك هێنان [ف] فراهم آوردن.

**دابینی:** ئارامی، هێمنایەتی [ف] آرامش.

**داپ:** داب [ف] عادت.

**داپـاچ:** کەسێ بەتـەور یان بەتیخ شتێ لەسـەرەوە بەرەوخـوار دەبڕێ: (دارەکانی **داپاچی**) [ف] کسی که با تَبر یا تیغ چیزی را از بالا بەپایین قطع کُند.

**داپاچەر:** داپاچ [ف] نگا: داپاچ.

**داپاچین:** داپاچ [ف] نگا: داپاچ.

**داپاچێن:** داپاچ [ف] نگا: داپاچ.

**داپـاڵین:** ۱) پالاوتن؛ ۲) بە تنـوٚك چکـانـدن [ف] ۱) تصفیه کردن؛ ۲) قطرەقطرە چکاندن.

**داپچـڕان:** ۱) زەق‌و گوشـادکـردن: (زار **داپچـڕان**، چاو **داپچـڕان**)؛ ۲) لەسـەرەوە بوٚخـوار دڕان [ف] ۱) بازشُدن چشم و دهان؛ ۲) از بالا بەپایین پارە شُدن.

**داپچـڕانـدن:** ۱) داچەقاندنی دەم‌و زەق‌کردنی چاو؛ ۲) لەسەر بوٚخوار دڕاندن [ف] ۱) باز کردن چشم و دهان؛ ۲) از بالا بەپایین پارە کردن.

**داپچڕین:** داپچڕاندن [ف] نگا: داپچڕاندن.

**داپڕسکان:** دابەڕزین [ف] بەچیزی هجوم بُردن.

**داپـڕوزقـان:** روُت بوُنەوەی لکەدار یان هێشو لەگەڵاو دەنك [ف] لُخت شدن از برگ و بَر.

**داپـڕوزقـاندن:** روُت کردنەوەی لك یان هێشو لەگەڵاو دەنك [ف] لخت کردن درخت از برگ و بَر.

**داپڕوزقانن:** داپڕوزقاندن [ف] نگا: داپڕوزقاندن.

**داپڕوزقیان:** داپڕوزقان [ف] نگا: داپڕوزقان.

**داپڕوزقین:** داپڕوزقان [ف] نگا: داپڕوزقان.

**داپڕوسکان:** داپڕوزقان [ف] نگا: داپڕوزقان.

**داپڕوسکاندن:** داپڕوزقاندن [ف] نگا: داپڕوزقاندن.

**داپڕوسکین:** داپڕوزقان [ف] نگا: داپڕوزقان.

**داپژان:** بڵاوبونەوەی شتی ورد [ف] پاشیدن و پراکندەشُدن.

**داپژاندن:** بەرەو ژێر رشتنی شتی ورد [ف] پاشیدن.

**داپسکـان:** ۱) بەکـزی کروشمـەکـردن؛ ۲) فس‌خواردنی مریشك بوٚ کەڵەشێر، داتسیان [ف] ۱) کِز کردن؛ ۲) حالت نشستن مُرغ در مقابل خُروس.

**داپسکیان:** داپسکان [ف] نگا: داپسکان.

**داپسیان:** داپسکان [ف] نگا: داپسکان.

**داپلاندن:** داپاڵین [ف] نگا: داپاڵین.

**داپلوٚخان:** پێست فرێدان لەسوُتان [ف] سوختن و افتادن پوست.

**داپلۆخان:** داپلوٚخان [ف] سوختن و از بین رفتن پوست.

**داپلۆخاندن:** سوتاندنی پێست [ف] پوست سوزانیدن.

**داپلۆخاو:** پێست داماڵاو بەسوُتان [ف] پوست انداخته از سوختگی.

**داپلۆخین:** داپلۆخان [ف] سوختن و از بین رفتن پوست.

**داپلۆخیو:** داپلۆخاو [ف] پوست انداخته از سوختگی.

**داپلۆسان:** دارکاری کردنی خەست‌و لەسەریەك [ف] کتك‌کاری سخت و پیاپی.

**داپلۆساندن:** داپلۆسان [ف] نگا: داپلۆسان.

**داپلۆستن:** داپلۆسان [ف] نگا: داپلۆسان.

**داپلۆسکان:** داپڕوزقان [ف] نگا: داپڕوزقان.

**داپلۆسکانن:** داپلۆسکان، داپڕوزقان [ف] نگا: داپڕوزقان.

**داپلۆسکیان:** روُتـەوەبوُنی لك یان هێشو لەگەڵاو دەنك [ف] لُخت شدن

شاخه یا خوشه از برگ و دانه.
**داپلۆسین:** داپلۆسان ف نگا: داپلۆسان.
**داپۆش:** سەرپۆش دانەر ف سرپوش گذار.
**داپۆشان:** ۱) بریتی لە تەواوکردنی خانو؛ ۲) وەشارتن بەهۆی سەرپۆش؛ ۳) پۆشینی سوڕو نهێنی خەڵــك ف ۱) کنــایه از تمـام کردن کار ساختمان؛ ۲) و ۳) سرپوش گذاشتن.
**داپۆشاندن:** داپۆشان ف نگا: داپۆشان.
**داپۆشانن:** داپۆشان ف نگا: داپۆشان.
**داپۆشراو:** وشارتو بەهۆی سەرپۆشەوە ف پوشیده.
**داپۆشەر:** کەسێ کە دادەپۆشێ ف پوشاننده.
**داپۆشین:** داپۆشان ف نگا: داپۆشان.
**داپەچ:** قوُت دەر ف بلعنده.
**داپەچنین:** قوُتدان ف بلعیدن.
**داپەچین:** قوُت چوُن ف فروشدن در گلو.
**داپــەڕ:** ۱) بزوتنــەوە بەچــالاکی؛ ۲) چاونەترسان لەکار ف ۱) حرکت بانشاط؛ ۲) اقدام.
**داپەڕژاندن:** ئاو لە سەرەوە هەڵداشتن ف آب پاشیدن از بالا.
**داپەڕژنین:** هەڵ پەرتاوتن، هەڵپاچینی لك و پۆپی‌دار ف هرس درخت.
**داپەڕین:** سەربەرەژێر بلەزچون ف باشتاب فروآمدن.
**داپیتن:** هەڵ پەرتاوتن ف هرس درخت.
**داپێچ:** شەتەكدان، توندبەستن، جەڕەبابە ف محکم بستن و گره زدن.
**داپێچــانــدن:** ۱) داپێچ؛ ۲) رەپێچــەكدان، بەرخــۆدان‌و ڕارفــاندن ف ۱) محکم بستن و گره زدن؛ ۲) با فشار به جلو راندان.
**داپێچانن:** داپێچاندن ف نگا: داپێچاندن.
**داپێچین:** داپێچان، داپێچاندن ف نگا: داپێچاندن.
**داپیر:** نەنك، دایکی دایك‌و باب، نەنە، نەنێ ف مادربزُرگ.
**داپیرك:** داپیر ف مادربزُرگ.
**داپیرۆشك:** ۱) جاڵجاڵۆکە، کاکڵەموشان؛ ۲) پیرایشۆکە، جانەوەرێکی بۆری چکۆڵەیە، داپیرۆکە ف ۱) عنکبوت؛ ۲) خرخاکی.
**داپیرۆکــە:** پورایشــۆکە، پیرایشۆکە، جانەوەرێکی بۆرو خڕکەڵە یە گلْ لەسەر کونەکەی هەڵدەدا ف خرخاکی.
**داپیره:** داپیر ف مادربزُرگ.
**دات:** ۱) کردەی رابردو لە: دان، بەخشین؛ ۲) پرسیاری‌دان بۆ رابردو: (ئــاخــری **دات** پێ؟) ف ۱) ماضی مطلق از فعل دادن دوم شخص مفرد؛ ۲) آیا دادی؟.
**داتاش:** تاشەر ف تراشنده.
**داتاشان:** تاشران لەسەرەوە بۆخوار ف از بالا بەپایین تراشیدن.
**داتاشین:** تاشین لەسەرەوە بۆخوار ف از بالا به پایین تراشیدن.
**داترۆسکان:** راچەنین لەترسان ف یکه‌خوردن.
**داترۆسکاندن:** راچەناندن ف شُکه‌کردن.
**داترۆسکیان:** داتروسکان ف یکه‌خوردن.
**داتسیان:** داهــاتون نزیك‌بە رۆخان: (ئەودیوارە **داتسیاگە**) ف کج‌شُدن نزدیك به اُفتادن.
**داتسین:** داتسیان ف نگا: داتسیان.
**داتکان:** دڵۆپەدڵۆپە هاتنەخوار ف چکیدن.
**داتکاندن:** بەدڵۆپ رژاندن سەربەرەخوار ف چکاندن.
**داتکانن:** داتکاندن ف چکانیدن.
**داتلیشان:** جڕخواردن لەسەرەوە بۆخوار ف شکافتن از بالا بەپایین.
**داتلیشــانــدن:** لەسەرەوە بۆخوار دڕاندن، قەڵاشتن ف از بالا تا پایین شکافتن و دریدن.
**داتلیشانن:** داتلیشاندن ف نگا: داتلیشاندن.
**داتلیشاو:** دڕاو لەسەرەوە بۆخوار ف از بالا تا پایین شکافته.
**داتلیشیاگ:** داتلیشاو ف نگا: داتلیشاو.
**داتلیشیان:** داتلیشان ف شکافتن از بالا تا پائین.
**داتوُڕاندن:** فیڕاندن، توُڕاندن، بەلەفیڕەگرتن ف اسهال گرفتن.
**داتوروسکان:** داتروسکان ف شُکّه‌شدن.
**داتوروسکانن:** داتروسکاندن ف شُکّه‌کردن.
**داتولان:** تولانەوە ف نگا: تولانەوە.
**داتولاو:** لەبەریەك چوُگ لەکولان ف از شدّت پُختن لِه شُده.
**داتولین:** حاڵەتی داتولان ف لِه‌شُدن از زیاد پُختن.
**داتــەپان:** ۱) قوُپانی سەربان؛ ۲) کوتانەوە بەبێڵ‌و هەرچی ف ۱) فرو رفتن بام؛ ۲) کوبیدن با بیل و...
**داتەپاو:** ۱) زەوی‌و گڵی قوپاو؛ ۲) کوتێنراو ف ۱) زمین و بام فرورفته؛ ۲) کوبیده شُده.
**داتەپکین:** داتەپان ف نگا: داتەپان.
**داتەپین:** داتەپان ف نگا: داتەپان.
**داتەقان:** بەپەلەپەل دابێژران ف باعَجَله بیختن.
**داتەقاندن:** دابێژتنی بەپەلەپەل ف باشتاب بیختن.
**داتەکان:** ۱) سەربەرەوخوار ڕاوەشان؛ ۲) بریتی لە والا بوُنی دەفری وەك کیســەو جەواڵ بەهۆی راوەشاندن ف ۱) تکاندن؛ ۲) کنایه از خالی شدن محتوی کیسه بەدلیل تکاندن.
**داتــەکــاندن:** ۱) لەسەرەوە بۆخوار راوەشاندن؛ ۲) بریتی لە هیچ تێدا نەهێشتن ف ۱) فروتکاندن؛ ۲) کنایه از خالی کردن کیسه بوسیله تکانیدن.
**داتەکانن:** داتەکاندن ف نگا: داتەکاندن.
**داتەکاو:** راوەشاو لەسەرەوە بۆخوار ف فروتکانیده.
**داتەکیان:** داتەکان ف نگا: داتەکان.
**داتەکی:** داتەکاو ف فروتکانیده.
**داتەکین:** داتەکان ف نگا: داتەکان.
**داتەکیو:** داتەکاو ف نگا: داتەکاو.
**داتەمریاگ:** دامرکاو، بێ‌دەنگ‌و ئارام دانیشتو ف آرام و ساکت نشسته.
**داتەمریان:** داسەکنان، دامرکان، هەدادان ف آرام و ساکت نشستن.
**داتەمین:** خەمباری، مەینەتباری ف اندوهناکی.
**داجۆین:** بزوتنەوە، حەرەکەت کردن ف جُنبیدن.

**داچاندن:** ۱) توّم بەزەویەوە کردن؛ ۲) ئارد کەم کەم بەسەر روّندا کردن [ف] ۱) تخم بر زمین افشاندن؛ ۲) آرد بر روغن تفته ریختن.

**داچزان:** چزان، ئەندام بەویکەوتنی ئاگر سوٗتان [ف] سوختن بدن از تماس مستقیم با آتش.

**داچزاندن:** داغ بە ئەندامی لەشەوە نان [ف] سوزاندن.

**داچکاندن:** هەلّواسین، دالەقاندن [ف] آویختن.

**داچلّەکان:** راچلّەکین لەترسان یان لەخەبەری سەمەرە [ف] یکّەخوردن.

**داچلّەکاندن:** بوٗنەهوٗی داچلّەکان [ف] شُکّەکردن.

**داچلّەکانن:** داچلّەکاندن [ف] شُکّەکردن.

**داچلّەکاو:** شلّەژاو، لەنەکاو لەرزیو لە ترسان یان لە خەبەری سەیرو سەمەرەو ناخوّش [ف] شُکّە شدە.

**داچلّەکیاگ:** داچلّەکاو [ف] شُکّەشدە.

**داچلّەکیان:** داچلّەکان [ف] یکّەخوردن.

**داچلّەکین:** داچلّەکان، داچلّەکیان [ف] یکّەخوردن.

**داچلّەکیو:** داچلّەکاو [ف] شُکّەشدە.

**داچناو:** زەوی توّو پیّوەکراو [ف] زمین بَذر پاشیدە.

**داچنراو:** داچناو [ف] زمین بَذر پاشیدە.

**داچنین:** ریزکردنی شت بەتەنیشت یەکەوە بە ریّك‌وپیّکی، لەسەریەك هەلّچنین: (دەوری‌و قاپەکان لەسەر سفرە **داچنە**، کتیّبەکان لەسەر رفە **داچنە**) [ف] پهلوی هم چیدن و مُرتّب کردن.

**داچوّڕان:** ۱) هاتنەخواری ئاوی کەم لەسەرەو ژیّرەوە؛ ۲) خەلاس بوٗنی ئاو لە دەفرا [ف] ۱) چکیدن؛ ۲) خشکیدن آب چشمە و...

**داچوّڕاندن:** بەتالّ کردنی ئاو [ف] خُشکانیدن آب.

**داچوّڕانن:** داچوّڕاندن [ف] خُشکانیدن.

**داچوّڕیان:** داچوّڕان [ف] نگا: داچوّڕان.

**داچوّڕین:** داچوّڕان [ف] نگا: داچوّڕان.

**داچون:** ۱) نەوی بوٗن‌و قوپان: (سەربانەکە **داچوە**، هەویرەکە **داچوە**) [ف] فرورفتن.

**داچەقان:** ۱) ڤەکرانی دەڤ‌و... : (دەمی **داچەقاند**)؛ ۲) تیّراچوٗن: (دڕك بەپاما **داچەقی**)؛ ۳) بەزەویدا چون: (دارەکە لەقوڕ **داچەقی**) [ف] ۱) بازکردن دهن و...؛ ۲) خلیدن؛ ۳) فروشدن در زمین.

**داچەقاندن:** کردەی داچەقان [ف] نگا: داچەقان.

**داچەقانن:** داچەقاندن [ف] نگا: داچەقان.

**داچەقاو:** بەرکاری داچەقان [ف] صیغۀ مفعولی از مصدر «داچەقان».

**داچەقیاگ:** داچەقاو [ف] صیغۀ مفعولی از مصدر «داچەقان».

**داچەقیاو:** داچەقاو [ف] نگا: داچەقاو.

**داچەقین:** داچەقان [ف] نگا: داچەقان.

**داچەقیّن:** ئەوەی دادەچەقیّنیّ [ف] صیغۀ فاعلی از مصدر «داچەقان».

**داچەکان:** سیس‌بوٗن‌و مل کزبوٗن [ف] افسردگی و پژمُردگی.

**داچەکاو:** سیس هەلّگەڕاو، مل‌داخستو لە کزیان [ف] افسردە و پژمردە.

**داچەکین:** داچەکان [ف] ضعف و افسردگی.

**داچەلاندن:** دالەقاندن، بەرەوژیّر هەلّواسین، شوّڕەوکردن [ف] آویختن.

**داچەندراو:** زەوینی توّم پیّوەکراو [ف] زمین بَذرپاشی شُدە.

**داچەنراو:** داچەندراو [ف] زمین بذرپاشی شُدە.

**داچەندن:** توّم‌پیّدانی زەوی [ف] بَذرافشانی.

**داچەنن:** داچەندن [ف] بَذرافشانی.

**داچەنەچەن:** هیّندە مەلّیّ، چەقەمەکە، وسکوت‌بە [ف] خاموش باش.

**داچین:** بابڕوین [ف] بگذار برویم.

**داچیّن:** ئەوی توّم ئەپاشیّ [ف] بَذرپاش.

**داچیّندراو:** توّم پیّوەکراو، داچناو [ف] بَذرافشانی شُدە.

**داچیّنراو:** داچناو [ف] بذرافشانی شُدە.

**داحبا:** ۱) جانەوەری دڕندە؛ ۲) جانەوەریّ کە ناناسریّ، دەعبا، داعبا [ف] ۱) دَدْ، دَرّندە؛ ۲) حیوان شناختە نشُدە.

**داخ:** ۱) حەیف، مخابن؛ ۲) خەم، کەسەر؛ ۳) تاسە، عەزرەت؛ ۴) زوّرگەرم؛ ۵) بەئاگر چزاندن، داغ؛ ۶) لەپاش وشەی «شاخ» بەمانای: چیا، کیّو: (لەوشاخ‌و **داخە** سەرکەوتین)؛ ۷) دروشم [ف] ۱) دریغ؛ ۲) غم، اندوە؛ ۳) حسرت؛ ۴) بسیار گرم، حارّ؛ ۵) سوزاندن با آتش؛ ۶) کوە؛ ۷) آرم.

**داخدار:** خەمبار، دل‌بکول [ف] اندوهگین.

**داخرا:** ۱) *بوّ دەرك‌و پەنجەرە دەلّین*. پیّوەدرا. بەسترا. قفلّ‌درا؛ ۲) *بوّ بەرەو نوین دەلّین*. راخرا: (فەرش **داخرا**) [ف] ۱) بستە شد، قُفل شد؛ ۲) پهن شد. *برای فرش و... گفتە می‌شود*.

**داخراو:** ۱) پیّوەدراو، قفلّ‌کراو؛ ۲) راخراو [ف] ۱) بستەشُدە، قُفل شُدە؛ ۲) پهن شدە، گُستردە.

**داخرپان:** داخرپیان [ف] یکّەخوردن.

**داخرپیان:** دلّەکوتە، شلّەژان [ف] یکّەخوردن.

**داخریاگ:** داخراو [ف] نگا: داخراو.

**داخز:** شویّنی لیّژ [ف] شیب.

**داخزان:** بەخشکە هاتنەخوار [ف] سُر خوردن و پائین آمدن.

**داخزاو:** بەخشکە داکەوتو [ف] سُر خوردە و پائین آمدە.

**داخزین:** داخزان [ف] سُر خوردن و پائین آمدن.

**داخزیّن:** کەسیّ کە بەخشکە شتیّك بەرەوژیّر دەبا [ف] کسی کە چیزی را سُر دهد.

**داخستن:** ۱) پان‌کردنەوە لەسەر زەوی، راخستن: (بەڕەکەم **داخست**)؛ ۲) پیّوەدانی دەرك‌و پەنجەرە، قفلّ‌کردن؛ ۳) فڕیّدانەخوار لە سەرەوە: (لکەدارەکانم **داخست**)؛ ۴) لەدەست کەسیّ یاشتیّکەوە کەوتنە سەر زەوین؛ ۵) هەلّ‌کردنی تەندورو کلّی دیّزەو گوّزەو سوّبە؛ ۶) خیم‌دانانی خانو: (بناغەم **داخست**)؛ ۷) نەوی کردن: (لەخەجالّەتی سەری **داخست**)؛ ۸) کوّکردن و دانان بوّ دواروّژ: (ئازوٗقەم **داخست**) [ف] ۱) پهن کردن و گُستردن؛ ۲) بستن در و پنجرە؛ ۳) پایین انداختن؛ ۴) توسط کسی یا چیزی زمین خوردن؛ ۵) برافروختن تنور و کورە؛ ۶) پی ریختن بنا؛ ۷) خم کردن و پایین آوردن؛ ۸) پس‌انداز و جمع‌آوری آذوقە.

**داخ کردن:** ۱) بەئاسنی سوٗرەوەبوٗ چزاندن؛ ۲) چوّقاندنی روّن؛

۳) بریتـــی له فریودانو زیان لێدان [ف] ۱) داغ گذاری؛ ۲) تفـــیدن روغن؛ ۳) کنایه از فریب دادن.

**داخگه:** جێگەی داخ کردنی ماڵات [ف] مکان داغ گذاری.

**داخڵ:** ژورەوە، ناوەوە، ناو [ف] داخل.

**داخڵە:** قوتوی دراوی دوکاندار [ف] صندوقچهٔ پول مغازەدار.

**داخ لەدڵ:** تورّە له روداوێ [ف] عصبانی و دل‌ریش.

**داخم:** حەیف، مخابن [ف] دریغا، افسوس.

**داخم‌ناچێ:** زۆرحەیف، بەداخەوە [ف] متأسفانه.

**داخۆ:** ئایاکو؟، ئایا، تۆبڵێی؟ [ف] آیا؟.

**داخوا:** داخۆ؟ [ف] آیا؟.

**داخواز:** ۱) پێویست، پێداویستی؛ ۲) داواکار، خوازەر [ف] ۱) موردنیاز؛ ۲) نیازمند.

**داخوازی:** پێویستی [ف] موردنیاز بودن.

**داخواستن:** خواستن، ویستن [ف] طلبیدن.

**داخو دوخان:** خەمو خەفەت، دەردومەینەت، کوڵو کەسەر [ف] غم و غُصّه.

**داخ‌ودەرد:** داخو دوخان [ف] غم و غُصّه.

**داخـــوران:** وردەوردە کەم‌بونـــەوەی کەنـداڵ لەدەم ئاو یان کەم‌کردنی بنی‌دیوار [ف] تحلیل رفتن.

**داخورپان:** داخرپیان [ف] یکّه‌خوردن.

**داخورپاندن:** شڵەژانی مرۆ بەترساندن یان بەخەبەری ناخۆش پێدان [ف] شُکّه کردن.

**داخورپیان:** داخرپیان [ف] یکّه خوردن.

**داخورپین:** داخرپیان [ف] یکّه‌خوردن.

**داخـورێـن:** ۱) تێ خورین؛ ۲) بەخـــۆ هەڵگـوتن [ف] ۱) نهیب زدن؛ ۲) لاف‌زدن.

**داخۆزین:** هاتنەخوار لە سواری، دابەزین، داوەزین [ف] پیاده شُدن.

**داخواستن:** داخۆزین [ف] پیاده شُدن.

**داخۆم:** داخۆ؟ [ف] آیا؟.

**داخویان:** نوسراوی پێودانو ڕێوشوێن بۆ خەڵك [ف] بیانیه.

**داخە:** ۱) فەرمان بەداخستن؛ ۲) گەرمە [ف] ۱) امر به «داخستن»؛ ۲) گرم است.

**داخەر:** کەسێ کاری داخستن دەکا [ف] صیغهٔ فاعلی «داخستن».

**داخەکەم:** بەداخەوە، حەیفی [ف] متأسفانه.

**داخی‌داخانم:** زۆر بەداخەوە، حەیف‌و مخابن: (ئێمە وتمان ئێوە ساداتن مەعاشتان نابڕن / **داخی داخانم** جەباری چۆن لە ئێوەشیان بڕی) «شێخ رەزا» [ف] با کمال تأسف.

**داخی گرانم:** داخی داخانم [ف] با کمال تأسف.

**داد:** ۱) هاوار؛ ۲) حوکمی ڕەوا، عدالت [ف] ۱) فغان، فریاد؛ ۲) عدالت.

**دادا:** ۱) وشـــەی ڕێزلـێنان بۆ دایك؛ ۲) تایەن، ژنی پیری سەرسپی پیرەژن پوپ چەرمـگ [ف] ۱) کلمـهٔ خطـاب احتـرام‌آمیـز به مـادر؛ ۲) پیرزن.

**دادان:** ۱) تاشینی قەڵـەم؛ ۲) فێرکردن: (دەرس **دادان**)؛ ۳) شان‌دان: (سەرمەشق **دادان**)؛ ۴) سەرەتا دامەزراندن: (تۆ گۆرەویەکەم بۆ **دادە** تا بیچنم)؛ ۵) کونو کەلێـن بەتـــۆپـــە قـورگـرتن: (دیـوارەکـــەم **داداوە**)؛ ۶) دەس پێکـــردنی بارش: (بـاران **دایدا**)؛ ۷) دەلانـدن: (ئەم‌کوپە ئاو **دائەدا**، گۆزەکە **دای داوە**)؛ ۸) بەردانەوەی پەردە؛ ۹) داخستنی دەرگاو پەنجـەرە؛ ۱۰) دەست لەسەر زەوی نان: (هەردوك دەستی **دادابـوُ**) [ف] ۱) تراشیدن قلم؛ ۲) تعلیم؛ ۳) نشان دادن؛ ۴) گرەهـــای اوّل بافـتنی؛ ۵) ترمیم سوراخ و خرابی دیوار با گِل؛ ۶) شروع بارنـدگی؛ ۷) نشت کردن؛ ۸) انداختن پرده؛ ۹) بستن در و پنجره؛ ۱۰) دست بر زمین نهادن.

**دادانـەوە:** ۱) بەردانـەوەی پـەردە؛ ۲) کـونو کەلێـن بەقوڕ گرتن [ف] ۱) انداختن پرده؛ ۲) گرفتن سوراخ دیوار با گِل.

**دادبەر:** گلی‌کار، شکایەت‌کەر [ف] شاکی، دادخواه.

**دادپرس:** فریارەس، کەسێ بەهاواری پیاو دەگاو لە شکایەتی دەپرسێ [ف] کسی که به شکایات دیگران می‌رسد.

**دادپەروەر:** خاوەن‌داد، عادڵ [ف] دادپَروَر.

**دادخوا:** دادبەر [ف] دادخواه.

**دادخواز:** دادبەر [ف] دادخواه.

**دادخوازی:** گلی‌کردن، شکایەت کردن [ف] دادخواهی.

**دادخوایی:** دادخوازی [ف] دادخواهی.

**دادڕ:** زۆر دڕیاو: (کراسەکەی **دادڕی**) [ف] پاره.

**دادڕان:** دڕان لەباری درێژیەوە [ف] پاره شُدن طولی.

**دادڕاو:** داتلیشاو [ف] پاره شده از طول.

**دادڕدادڕ:** ۱) لەچەند جێوە دڕاو، شڕووڕ؛ ۲) لەت لەت‌بونی زەوی لەبەر ئاوی ئاوداشتن [ف] ۱) پاره‌پاره شُده؛ ۲) زمین قطعه‌قطعه شُده توسطه آب.

**دادرون:** دوشت بەسەریەکدا درون: (لەچکی کەواکەی بۆ **دادروم**، ئەم پینەیەم بۆ **دادرو**) [ف] بهم دوختن.

**دادڕەس:** هانا، فریارەس [ف] فریادرس.

**دادڕیاگ:** دادڕاو [ف] پاره‌شدهٔ طولی.

**دادڕین:** کاری دادڕان [ف] دریدن، پاره کردن.

**دادك:** دایك، داڵك [ف] مادر.

**دادگا:** مەحکەمە، جێگەی شکات‌کردن [ف] دادگاه.

**دادگە:** دادگا [ف] دادگاه.

**دادگەر:** دادپەروەر [ف] دادگر، عادل.

**دادگێڕ:** دادگەر [ف] دادگر.

**دادوبسەت:** مامڵە، سەودا، کڕین‌و فرۆشتن [ف] معامله.

**دادوبێداد:** هاوار لەدەست ناحەقی کەر [ف] داد و بیداد.

**دادوُران:** دادرون [ف] بەهم دوختن.

**دادوُرانن:** دادرون [ف] بەهم دوختن.

**دادۆش:** ۱) شیردۆش؛ ۲) بریتی لەکەسێ کە بەگزی دۆستەو بەهرە دەبا [ف] ۱) شیردوش؛ ۲) دوست دغل.

**دادۆشین:** ۱) دۆشین تا ئاخردڵۆپ؛ ۲) بریتی لە بەهرەبردنی ناڕەوای

دۆستی گزی‌کار [ف] ۱) تا قطرهٔ آخـــر دوشیدن؛ ۲) کنـــایه از سوءِ استفادهٔ دَغَل‌دوستان.

**دادوفوغان:** دادوهاوار، هەراو هوریا [ف] فریاد و فغان.

**دادۆك:** تایەن، دایەن [ف] دایە.

**دادوەر:** ئەوی بەشکایەتان رادەگا [ف] قاضی.

**دادە:** ۱) فـەرمـان بە «دادان»؛ ۲) خوشکـی گەورە؛ ۳) داڵـك، دایك [ف] ۱) فعل امر از مصدر «دادان»؛ ۲) خواهر بزرگتر؛ ۳) مادر.

**دادەنگ:** فەرمان بە بێدەنگ‌بون: (**دادەنگ** بزانین چبوە!) [ف] ساکت شو.

**دادەی:** ۱) ئابـزانم چۆن؛ ۲) خوشکـی گەورەی ئـەو؛ ۳) دایکـی ئەو؛ ۴) وشەی هانەدان: (**دادەی کورگـەل راکەن**) [ف] ۱) بگـذار ببینـم؛ ۲) خواهر بزرگتر او؛ ۳) مادر او؛ ۴) کلمهٔ تشجیع.

**دادی:** تایەن، دایەن [ف] دایە.

**دادێران:** راداشتن، داهێشتن، منـاڵ بەسەردەستەوە گرتن بۆ زیاندن [ف] سرپا گرفتن بچّه.

**دادیلە:** وشەی دواندنی خوشکی چکۆڵە [ف] کلمهٔ نوازش خواهر کوچکتر.

**دار:** ۱) درخـت: (**داربـی، دارگـوێـز**)؛ ۲) چێـو: (**دار دەسـت**)؛ ۳) قەلاشکەری، ئێزنگ؛ ۴) قەنارە: (**داری ئیعدام**)؛ ۵) ربەی خوێ پێوان: (**دارێ خوێ بەچەند؟**)؛ ۶) سامان، ماڵ، دارایی: (**دارو نەدارم ئەوەنـدەبـو**)؛ ۷) پاشگری بەواتا: خاوەن: (**خێزان دار، مەڕدار**) [ف] ۱) درخت؛ ۲) چوب؛ ۳) هیزم؛ ۴) دار اعدام؛ ۵) پیمانه نمك فروش؛ ۶) ثروت، دارایی؛ ۷) پسوند بەمعنی صاحب، خداوند.

**دارا:** ۱) دەوڵـەمـەند، بـوُدە، زەنگیـن؛ ۲) جـۆرێ دەرمـانی چاوێشە؛ ۳) جۆرێ کوُتـاڵ؛ ۴) ناوێ پیاوانـە [ف] ۱) ثروتمند؛ ۲) از داروهای چشم؛ ۳) نوعی پارچە؛ ۴) اسمی مردانه.

**دارارەش:** دارێکی لێرەوارەو زۆر ئەستوُرو بڵند دەبێ [ف] درختی است جنگلی.

**داراش:** دالاش [ف] لاشخور.

**داراغـان:** گونـدێکی کوردستـانە بەعسی وێرانی کرد [ف] روستایی در کردستان که به وسیله بعثیها ویران شد.

**دارانەوە:** بوُرانەوە، دڵ لەخۆچوُن، لەسەرخۆچوُن [ف] غش کردن.

**دارایی:** ۱) کۆڵـوانـە لەپـارچەی دارا؛ ۲) کارگێڕی باج‌ساندن [ف] ۱) چارقد؛ ۲) ادارهٔ دارایی.

**دارباز:** تەنافبار، پەلهەوان [ف] بندباز.

**داربازە:** داربەست، تابوُت [ف] تابوت.

**داربـڕ:** ۱) دڕندەیەکی چکۆڵەیە لەتیرەی پشیلە؛ ۲) کەسێ کە بە بیور داران دەبڕێ [ف] ۱) درّندەی از تیرهٔ گربەسانان؛ ۲) هیزُم‌شکن.

**داربۆکردن:** برێتی لە سزادانو تۆڵە لێ‌ساندنەوە [ف] کنایه از انتقام گرفتن.

**داربـەس:** ۱) قایمـەمێو؛ ۲) تابوُتی مردوُ گوێزانەوە؛ ۳) دارلێکدان بۆ سیمان تێ‌کردن [ف] ۱) داربَست تاك؛ ۲) تابوت؛ ۳) داربَست بنّایی.

**داربەست:** داربەس [ف] نگا: داربەس.

**داربەسەر:** ناوی سێ گوندی کوردستانە کە دوانی بەعسی وێرانی کرد [ف] نام سه روستا در کردستان.

**داربەند:** دارلێکدانی چیمەنتۆکاری [ف] داربست بنایی.

**داربـەنـدەخوێن:** داردۆخین، دارێ کە هۆجەنەی تێدەخەنو لە دەرپێ رادەکەن [ف] وسیلەای که بدان بند تُنبان را در نیفه کشند.

**داربەنْك:** دارەبەن، دار کەسکان [ف] درخت بنه.

**داربـــێر:** داری رایەڵ‌کراوی نێوان دوشـــراوو نە دۆشـــراو لەکـــاتـی مەڕدۆشیندا [ف] چوب فاصـــل میان گوسفنـدان دوشیده و نادوشیده هنگام دوشیدن گلّه.

**داربێرە:** داربێر [ف] نگا: داربێر.

**دارپاچ:** تەرداس، تەورداس [ف] دهره.

**دارپشکێڤ:** بای وادەی نزیك بەهار [ف] سرآغاز باد بهاری.

**دار پوُچ:** داری پیری گەندەڵ [ف] درخت از پیری پوسیده.

**دارتاش:** نەجار [ف] درودگر، نجار.

**دارتاشخانە:** دوکانی نەجاری [ف] کارگاه نجاری.

**دارتوُ:** ۱) دارەتفێ؛ ۲) خڵتەی شتی تراو، تڵپ [ف] ۱) درخت توت؛ ۲) دُردی.

**دارتورکنەك:** دارکوتکە، دارکوت، دارتەقێنە، مەلێکە [ف] پرندهٔ دارکوب.

**دارتۆفانە:** بوُز، بەوز [ف] درخت پشه.

**دارتومەك:** سازو دنبەك پێکەوە، سازو دەوڵ [ف] ساز و ضرب.

**دارتوُن:** قڕقڕە، چڕك [ف] قرقره.

**دارتەرم:** تابوُت، داربەست [ف] تابوت.

**دارتـەڤن:** دەزگا ی تەونگەران، چوارچێوەی قالْی چنین [ف] چارچو به دستگاه قالی‌بافی.

**دارتەقێنە:** دارکوتکە [ف] دارکوب.

**دارتەل:** داری بەرز کە تەلەفونی بەسەردا رایەڵ کراوە [ف] عمود تلفن.

**دارتەون:** چوارچێوەی تەونگەری، دارتەڤن [ف] چارچوبهٔ دستگاه قالی‌بافی.

**دارتێل:** دارتەل [ف] عمود تلفن.

**دارجغارە:** مۆدنە، دەمنە، باسك [ف] چوب سیگار.

**دارجگەرە:** دارجغارە [ف] چوب سیگار.

**دارچك:** دەوەن، چڵو [ف] درخت بوتەای.

**دارچین:** توێکڵەدارێکە تیژو بۆن‌خۆش [ف] دارچین.

**دارچینی:** دارچین [ف] دارچین.

**دارداروُك:** برێتی لە نانی زۆر کۆن و رەق هەڵاتو [ف] کنایه از نان کهنه و خشك شده.

**داردان:** ۱) عەمـــاری ئێزنـــگ؛ ۲) جێ‌نەمـــامو ریشـەی زۆر؛ ۳) لە قەنـارەدان، لە سێ‌دارەدان [ف] ۱) اَنبار هیزم؛ ۲) نهالستان؛ ۳) بەدار آویختن، دارزدن.

**داردۆژەنـگ:** داری ئەم‌لاو ئەولای مەشکـە، کە بەزمانە دەخرێتە ناو *لۆلەپەوە* [ف] دو چوب کنارهٔ مَشك.

**داردەس:** چێوێ کە بەدەستەوە دەگیردرێ [ف] چوبدستی.

**داردەست:** داردەس [ف] چوبدستی.

**داردینْـك:** ۱) داری راهـەنگـاو بەسەر ئاخوڕدا؛ ۲) ئاخوڕ لەداری ناو کۆڵدراو [ف] ۱) چوبی کە سر آخور گذارند؛ ۲) آخوری کە از چوب سازند.

**دارڕزان:** ۱) داتولاّن؛ ۲) ڕزین تەواوی [ف] ۱) بسیار پُختن؛ ۲) پوسیدن و از هم پاشیدن.

**دارڕزانـدن:** ۱) تـولاّنـدنـەوە؛ ۲) ڕزانـن [ف] ۱) بسیـار جـوشانـدن؛ ۲) پوساندن.

**دارڕزانن:** دارڕزاندن [ف] نگا: دارڕزاندن.

**دارڕزاو:** داتولاّو [ف] از هم پاشیده، بسیار پخته.

**دارڕزای:** دارڕزاو [ف] از هم پاشیده، بسیار پخته.

**دارڕزیاگ:** دارڕزاو [ف] نگا: دارڕزاو.

**دارڕزیان:** دارڕزان [ف] نگا: دارڕزان.

**دارڕزیاو:** دارڕزاو [ف] نگا: دارڕزاو.

**دارڕزین:** دارڕزان [ف] نگا: دارڕزان.

**دارڕزیو:** دارڕزاو [ف] نگا: دارڕزاو.

**دارڕژان:** ۱) لەسەرەوە بۆخوار ڕژان؛ ۲) دەناو قاڵب کردن [ف] ۱) پایین ریختن؛ ۲) ریختەگری.

**دارڕژاندن:** ۱) سەرەوخوار ڕشتن؛ ۲) دەقالب کردن [ف] ۱) پایین ریختن؛ ۲) قالب‌ریزی.

**دارڕژاو:** ۱) لە سەرەوە بۆخـــوار ڕژاو؛ ۲) دەقـــاڵبـدا دروست کراو [ف] ۱) پایین ریختەشدە؛ ۲) قالب‌ریزی شدە.

**دارڕژتن:** دارڕژاندن [ف] نگا: دارڕژاندن.

**دارژمـێر:** ژمـــاردنــی ئاژەڵ کە بە داردەست هیمـــایان بۆدەکـــەن [ف] سرشماری گلە با چوبدستی.

**دارڕژیان:** دارڕژان [ف] نگا: دارڕژان.

**دارڕژین:** دارڕژان [ف] نگا: دارڕژان.

**دارسان:** لێڕ، لێڕەوار، جەنگەڵ [ف] جنگل.

**دارڕسان:** هەڵمەت بردن، پەلاماردان [ف] یورش بردن.

**دارستان:** جەنگەڵ، لێڕەوار، دارسان [ف] جنگل.

**دارڕسکان:** پەلاماردان، دارڕسان [ف] یورش بردن.

**دارڕسکاندن:** گرتن و بەزۆر ڕاکێشان [ف] گرفتن و بەزور کشیدن.

**دارسیواك:** ئەو داروکەی نوێژکەران ددانی پێ دەماڵن [ف] چوب مسواك.

**دارشاخ کردن:** سوکایەتی بەسەر هێنان [ف] آبرو بردن.

**دارڕشتـن:** ۱) دارڕژانـدن؛ ۲) کل دەچاو کێشـان [ف] ۱) نگا: دارڕژاندن؛ ۲) سُرمەکشیدن.

**دارڕشتە:** دەقاڵب کراو [ف] در قالب شدە.

**دارشەق:** ۱) داری بن‌باڵی پاشکاو؛ ۲) کاشۆ، گۆچانی گەمەی شەقێن [ف] ۱) چوب زیر بغل؛ ۲) چوبدستی چوگان‌بازی.

**دارشەقێن:** کاشۆ، دارشەق [ف] چوبدستی چوگان‌بازی.

**دارغە:** قوڵچی ناوشار، پاسەوانی شار [ف] داروغە.

**دارفـرسـەق:** داری چەقـاو لـەدەم ڕێگـە بۆ مـاوە دیاری‌کـردن [ف] فرسنگ‌سار.

**دارڤـان:** ۱) داربڕ، کەسێ کە دار بەتەورو هەڕە دەبڕێتەوە؛ ۲) دارەوان، کەسێ کە باش دەتوانێ بەدرەخت هەڵگەڕێ، دارە وان [ف] ۱) کسی کە کارش قطع درخت است؛ ۲) کسی کە در بالا رفتن از درخت مهارت داشتە باشد.

**دارقـواخ:** دولکێ کە لەزەوی دەچەقێنن و لولەتفەنگی سەر دەخەن [ف] چوب یا فلز دوسری کە هنگام تیراندازی لولۀ تفنگ را بر آن تکیە می‌دهند.

**دارقەپان:** دارێك کە ئاڵقەی تەرازوی گەورەی پێدا دەکەن [ف] چوبی کە قپان را بدان وصل کُنند.

**دارقـەسپ:** ۱) دار خورمـا؛ ۲) دارێکە بۆ جوانی ڕای‌دەگرن وەك دار خورمادەچێ وبەر نادا [ف] ۱) درخت خرما؛ ۲) درخت خرمای زینتی.

**دارقەلۆتك:** لاسکی وشکی توتن و پەمۆ [ف] شاخۀ خشك پنبە و تنباکو.

**دارقەواخ:** دارقواخ [ف] نگا: دارقواخ.

**دارقـەوام:** ئامـرازی داری‌خوار ڕاست کردنەوە [ف] ابزار راست کردن چوب کج.

**دارك:** دەمارە تۆتن [ف] رگۀ برگ توتون.

**دار کار چْك:** داری کرۆسك [ف] نوعی گلابی وحشی.

**دارکاری:** بەدار لێدان [ف] با چوب زدن.

**دارك بژێر:** ۱) هەڵاواردنی دەمار لە توتن؛ ۲) کەسێ کە دەمار لە توتن جیا دەکاتەوە [ف] ۱) جُدا کردن رگەها از برگ توتون؛ ۲) کسی کە رگەها را از برگ توتون جدا می‌کند.

**دارکردن:** ئێزنگ کۆکردنەوە [ف] جمع‌آوری هیزُم.

**دارکرۆك:** دارکوتکە [ف] دارکوب.

**دارکرۆکە:** دارکرۆك [ف] دارکوب.

**دارکوت:** دارتەقێنە، دارتورکنەك [ف] دارکوب.

**دارکوتك:** دارێ کەئاگری پێ تێك وەردەدەن [ف] چوبی کە از آن برای برهم زدن آتش استفادە می‌شود.

**دارکوتکە:** دارکوت [ف] دارکوب.

**دارکۆرك:** دارکوتك [ف] نگا: دارکوتك.

**دارکـۆڵـك:** ۱) کۆڵکەداری جلیت بازی؛ ۲) کۆڵـەوەژی تەنـوور؛ ۳) دەوەن و چڵو [ف] ۱) تکە چوب بازی سوارکاران؛ ۲) نگا: کۆڵەوەژ؛ ۳) درختچۀ جنگلی.

**دارکونکەرە:** دارکوت [ف] دارکوب.

**دارکەپێچان:** برێتی لە کزو کەنەفت، لەڕو لاواز [ف] کنایە از لاغرِ مُردنی.

**دارکەر:** ۱) ئێزنگ کۆکەرەوە؛ ۲) داربڕ [ف] ۱) هیزُم جمع‌کُن؛ ۲) هیزم‌شکن.

**دارکیلە:** داروکـەی لێك‌کردنی کیلەی پێوانـە [ف] چوبکی کە ظرفیت پیمانە را تنظیم کند.

**دارگـــورد:** داری نێوان رایەڵی تەون [ف] چوب میان تارهـای قالی در

دستگاه قالی بافی.

**دارگوز:** داریّ که بەتەڵەوە دەیبەستن تانچیر نەتوانیّ بیبا ف چوبی که تله را بدان بندند.

**دارگوزدین:** داریّ که لەتوّپیّن‌دا لەتوّپی دەدەن ف چوب چوگان‌بازی.

**دارماڵ:** پڕاوپڕ، تمام‌تژە ف مالامال، لبالب.

**دارّمان:** روخانی سەربەرەوژیّر ف فروریزی.

**دارّماندن:** روخاندن لەسەر بوّخوار ف فروریختن.

**دارّمانن:** دارّماندن ف فروریختن.

**دارّماو:** روخاو لەسەرەوە بوّخوار ف فروریخته.

**دارّمین:** دارّمان ف فروریزی.

**دارّمیّن:** روخیّن لەسەرەوە بوّخوار ف فروریزنده.

**دارّن:** روتەوەکەر بەدەست ف پوست گیرنده.

**دارّنان:** روُتەوەبوُن بەهوّی دەست لەسەرەوە بوّخوار ف پوست‌انداختن.

**دارنده:** دارا، دەوڵەمەند، زەنگین ف ثروتمند.

**دارّنین:** روُتەوەکردن: (جلی لەبەرخوّی **دارّنی**، هیّشوی تریکەی دارّنیوە، گەڵای لیّ **دارّنە**) ف کندن و لُخت کردن.

**داروّ:** ۱) هەیە؛ ۲) هەیەتی ف ۱) هست؛ ۲) دارد.

**دارّوُ:** دەرمان حەمام ف واجبی.

**داروبار:** بریّتی لە هیّزو توان‌و لەش ساغی: (پیاویّ بە **داروبارە**) ف کنایه از توانایی و سلامت.

**داروبەر:** ۱) بریّتی لە هەموشت؛ ۲) بریّتی لە جیّگەی سەخت‌و چوّڵ ف ۱) کنایه از هرچیز؛ ۲) کنایه از زمین خشك و خالی از سکنه.

**داروپەردو:** بەردو دارو هەڵاشی خانوەڕوخاو ف ئاوار.

**دارّوُتان:** دارّنان ف نگا: دارّنان.

**دارّوُتاندن:** دارّنین ف نگا: دارّنین.

**دارّوُتانن:** دارّوتاندن ف نگا: دارّنین.

**دارّوُتاو:** دارّناو ف نگا: دارّناو.

**دارّوُتای:** دارّوُتاو ف نگا: دارّناو.

**دارّوجان:** دەنکیّکی رەشە لەناو برنجدا ف کدرم.

**دارّوچان:** ئاوەڕوُت‌بوُن ف پَرکنده شدن پرنده با آب گرم.

**دارّوچاندن:** ئاوەڕوُت کردن ف پَرکندن پرنده با آب گرم.

**دارّوچای:** ئاوەڕوُت کراو ف پَرکنده شده با آب گرم.

**داروچکە:** چیلکە، داری چکوّڵە ف تکّه‌چوب.

**دارّوّچکە:** داهیّڵراو ف فروهشته.

**دارّوّچکان:** داهیّڵان، داهیّشتن ف فروهشتن.

**دارّوّچکاندن:** داهیّڵان ف فروهشتن.

**دارّوّچکاو:** دارّوّچکە ف فروهشته.

**دارّوخان:** گوندیّکە لە کوردستان ف نام روستایی در کردستان.

**دارّوُخان:** دارّمان ف نگا: دارّمان.

**دارّوُخاندن:** دارّماندن ف نگا: دارّماندن.

**دارّوُخانە:** شویّنیّ لەحەمام کە دەرمانی موُداماڵی لیّ دەگرن ف جای واجبی گرفتن در گرمابه.

**دارّوخاو:** دارّماو ف فروریخته.

**دارّوخیاگ:** دارّماو ف فروریخته.

**دارّوخیاو:** دارّماو ف فروریخته.

**دارودەستە:** دەس‌و پیّوەند ف دارو دسته.

**دارو دەسە:** دارو دەستە ف دارو دسته.

**دارو دەوەن:** لیّرەواری بەپنچك ف تپّه و ماهور.

**داروّغە:** دارغە ف داروغه.

**دارّوگرتن:** دەرمان حەمام لە خوّدان ف واجبی گرفتن.

**داروُنی:** گوندیّکی کوردستانە بەعسی ویّرانی کرد ف روستایی که به وسیله بعثیها ویران شد.

**دارە:** ۱) خوّ بەپیّوە راگرتنی بەحەستەم‌و کەم: (کابرا لەروّیشتن‌دا **دارەی** دیّ)؛ ۲) داس ف ۱) بەزحمت خود را سرپا نگهداشتن؛ ۲) داس.

**دارەبازە:** داربەست، دودارە، تاوت ف تابوت.

**دارەبەش:** دابەش ف تقسیم.

**دارەبەن:** دارقەزوان، داربنیّشت، داربەنوشت ف درخت وَن.

**دارەپیچان:** داڵان، ریّگەی سەر داپوّشراو ف دالان.

**دارّەت:** قامچ، بەردەس، نزیك بوّ دەست تیّ‌گرتن ف در دسترس.

**دارەتو:** ۱) دار تفیّ؛ ۲) گوندیّکی کوردە بەعسی ویّرانی کرد ف ۱) درخت توت؛ ۲) نام روستایی که بعثیها ویران کردند.

**دارەدارە:** چوّنیەتی روّیشتنی منداڵی تازە پیّ گرتو: (مناڵەکە **دارەدارە** دەڕوا) ف حالت راه رفتن کودك تازه پاگرفته.

**دارەڕا:** داپوّشینی چاوەخانو بەکاریتەو دەستەك ف سقف‌پوشی با تیرك و الوار.

**دارەڕەش:** ناروەن، جوّریّ داری بیّ‌بەرو شەنگە ف درخت نارون.

**دارەست:** بەرگر، لەمپەر ف مانع.

**دارەسمە:** دارکوت ف دارکوب.

**دارەشکیّنە:** دەرمانیّکە بوّ برین ف دارویی که بر زخم گذارند.

**دارەغاڵ:** تەرە، بازەڵە، لەلان توّراو ف حیوان آواره از لانه، حیوان اهلی رم کرده از لانه.

**دارەغان:** دارەغال ف نگا: دارەغال.

**دارەقوتە:** گوندیّکی کوردستانە بەعسی ویّرانی کرد ف نام روستایی که بعثیها ویران کردند.

**دارە کەوە:** دارکوت، دارتەقیّنە ف دارکوب.

**دارەلەك:** گوندیّکە لە موکوریان ف روستایی در کُردستان.

**دارەمەیت:** دارتەرم، داربەست، تاوت ف تابوت.

**دارەوان:** کەسیّ باش بەدار هەڵدەچیّ ف کسی که در بالا رفتن از درخت مهارت دارد.

**دارەوەن:** بوُز، دارتوّفانە ف درخت پشّه.

**دارهەلوُك:** دارە دریّژەکەی گەمەی هەلوُکیّن ف چوب بلند بازی الك‌دولك.

**داری:** جوّریّك بەڕ، جوّریّ رایەخ ف نوعی گلیم.

**داریّ:** ۱) داسی درویّنه؛ ۲) شاریّکی کۆنی کوردە ف ۱) داس؛ ۲) نام شهری قدیمی در کردستان.

**داریانەوە:** ۱) بوُرانەوە، دلّ لەخۆچوون؛ ۲) بەملاو بەولادا کەوتن ف ۱) از حال رفتن؛ ۲) تلوتلو خوردن.

**داریّتن:** دارژتن، دارژاندن ف نگا: دارژاندن.

**داریّژگە:** قالّبی شت تیّدا تواندنەوەی پیشەسازان ف قالب ریخته‌گری.

**داریّژی:** کاری دەقالّب کردنی تاویاو ف ریخته‌گری.

**داری‌سەماوات:** بریّتی لە نارەحەت کردنی زۆر: (بەبەیە **داری سەماواتیّ** نیمە) ف کنایه از آزرده شدن بسیار.

**داریلانك:** گولّیّکی بۆن خۆشە ف گلی است خوشبو.

**دارین:** هەرشتیّ لەدار کرابیّ ف چوبین.

**دارینە:** دارین ف چوبین.

**داریّنە:** سەلە، نانەشان ف آبکش چوبین.

**داژدار:** ۱) قەلاّچی، پاسەوانی کەلهە؛ ۲) بریّتی لە لاگر و پاریّزەر ف ۱) نگهبان قلعه؛ ۲) کنایه از طرفدار.

**داژگیر:** بیّژنگی کون هەلّە بۆ گەنم پاکردن ف الك گندم پاك كردن.

**داژەندن:** بەرەوخوار بردن: (لوُتی **داژندوە**) ف پایین گرفتن.

**داژەنن:** ۱) داژەندن؛ ۲) هەلّواسین ف ۱) پایین گرفتن؛ ۲) آویزان کردن.

**داژەنین:** ۱) داژەندن؛ ۲) لەبەریەك هەلّوەشاندنی کەل‌و پەلی وەك سەعات‌و چەك ف ۱) پایین گرفتن؛ ۲) بهم زدن وسایلی چون ساعت و تفنگ.

**داژیار:** بژیو، رسق، رۆزی ف روزی، قوت.

**داس:** داریّ ف داس.

**داسپاردن:** راسپاردن، قەوینتی کردن ف سفارش کردن.

**داس پەرزیّن:** بەداس پەرّاندنی ویّنجەی ساوا تا پنجی قایمتر بیّ ف هرس یونجهٔ ضعیف برای تقویت آن.

**داستان:** چیرۆك ف داستان.

**داسخالّە:** داسی گوشاد کە تایبەتی گیادرونە ف داس گُشاد ویژهٔ درو گیاه.

**داسرەفتن:** هەدادان، ئارام گرتن، داسەکنان ف آرام گرفتن.

**داسرەوتن:** داسرەفتن ف آرام گرفتن.

**داسرەوین:** داسرەفتن ف آرام گرفتن.

**داسك:** ۱) داسی چکۆلە؛ ۲) تەورداس؛ ۳) هەودای دەزوو ف ۱) داس کوچك؛ ۲) داس شاخه‌بُری؛ ۳) تار باریك نخ.

**داسگ:** داسوی گولّی دەغلّ ف اخگل، سیخچه.

**داس‌مالّ:** درویّنەی گیا بەداس ف درو گیاه با داس.

**داس‌مالّە:** داس‌مالّ ف درو گیاه با داس.

**داسنی:** ۱) لەسەر ئایینی زەردەشتی؛ ۲) خواز بیّنی کەران ف ۱) زرتُشتی؛ ۲) خواستگاران.

**داسوُ:** پرزەی گولّی گەنم‌وجۆ ف اخگل، داسه.

**داسوُك:** داسوُ ف اخگل، داسه.

**داسوُکە:** داسوُ ف اخگل، داسه.

**داسولکە:** ۱) داسوُ؛ ۲) داسی پچوك ف ۱) اخگل؛ ۲) داس کوچك.

**داسە:** داسوُ ف اخگل.

**داسەکنان:** داسرەوین ف آرام گرفتن.

**داسەکناو:** سرەوتو، ئۆقرەگرتو ف آرام گرفته.

**داسەکنین:** داسەکنان ف آرام شُدن، آرام گرفتن.

**داسیلە:** داسی پچوك ف داس کوچك.

**داش:** ۱) کوُرەی ئاسنگەرو پیشەکاران؛ ۲) پیادەی دامەو شەترەنج ف ۱) کوره؛ ۲) پیادهٔ شطرنج و دامه.

**داشاخە:** ناشاخە، ئەیاغی میوەو... ف بُنْجُل.

**داش‌بەداش:** ۱) وشەیەکە لە گەمەی دامەدا؛ ۲) بریّتی لە تۆلّەساندنەوە ف ۱) اصطلاحی در بازی دامه؛ ۲) کنایه از انتقام گرفتن.

**داشت:** ئاژەلّی راگیراو بۆ بەروبوو ف دام نگهداری شده برای تولیدمثل.

**داشتن:** ۱) ئاولیّنان، ئاوياری، ئاودیّری؛ ۲) لەسەر بۆخوار شوشتن ف ۱) آبیاری؛ ۲) از بالا بەپایین شُستن.

**داشتە:** ۱) داشت؛ ۲) کۆنە: (نیم **داشتە** بەکاردیّ) ف ۱) نگا: داشت؛ ۲) کهنه.

**داشە:** داشت ف نگا: داشت.

**داشدار:** داژدار ف نگا: داژدار.

**داشداری:** لایەنگری، ئاگاداری، پاریّزگاری ف طرفداری.

**داشدیار:** بناوان، ئاگاداری مالّ ف مُدیر خانه.

**داشك:** بەچکەی کەر، جاش ف کره‌خر.

**داشکان:** ۱) هەلّبرّانی جۆگە بۆ ئاودیّری؛ ۲) لەحەساو کەم‌کردنەوە؛ ۳) رەتاندن ف ۱) شکستن جوی در کار آبیاری؛ ۲) از صورت حساب کسر کردن، تخفیف دادن؛ ۳) خسته‌کردن.

**داشکاندن:** داشکان ف نگا: داشکان.

**داشکانن:** داشکان ف نگا: داشکان.

**داش کەلەرم:** کەلەمی بیّ گەلاّی رەق وەك توُر دەخوریّ ف کلم قُمری.

**داش کەلەم:** داش کەلەرم ف کلم قُمری.

**داشگیر:** داژگیر ف نگا: داژگیر.

**داشلانە:** شاگردی کلیسا لە گوندەکانی کوردستان ف نام اختصاصی شاگردان کلیسا در کردستان.

**داشلّیقیان:** فلّیقانەوە، پلّیخانەوە ف لەشُدن.

**داشۆ:** ۱) براگەورە؛ ۲) وشەی دواندنی براگەورە ف ۱) برادر بزرگ؛ ۲) واژه‌ای برای خطاب به برادر بزرگ.

**داشۆران:** شۆردن بەئاو لەسەر بۆخوار ف از بالا بەپایین شُستن.

**داشۆرّان:** بەرەوژیّر شۆرّبوُنەوە ف آویزان شُدن.

**داشۆراندن:** شوشتن لەسەرەوە بۆخوار ف از بالا بەپایین شُستن.

**داشۆرّاندن:** شۆرّەوە کردن، داهیّلاّن ف آویزان کردن.

**داشۆراو:** بەئاو لەسەر تاخوار شۆریاو ف از بالا بەپایین شستشو شده.

**داشۆریاگ:** ۱) بەئاو شۆراو لەسەر تاخوار؛ ۲) بریّتی لە بیّ‌شەرم‌و ئابرّو ف ۱) از بالا بەپایین شُسته شُده؛ ۲) کنایه از بی‌شرم و حیا.

**داشۆڕیاگ:** داهێژراو لەسەرەوە بۆخوار، داهێڵراو [ف] آویزان شده.

**داشۆڕین:** داهێڵان، سەربەرەو ژێر داهێشتن [ف] آویزان شدن.

**داشوشتن:** نابوت بون [ف] ورشکست.

**داشەکان:** خواربونەوە لەملاو بەولادا [ف] آویزان شدن و بەهر طرف تکان خوردن.

**داشەکاندن:** خوارکردنەوە بەملاو بەولادا [ف] آویزان کردن و بەهر طرف تکان دادن.

**داشەهارە:** دوامین پیادەی گەمەی دامە [ف] آخرین مهره در بازی دامه.

**داشی:** هەژاری گوڵچین لە پەرێز [ف] خوشەچین.

**داشێ:** وشـەی ڕێز بۆ دوانـدنی برای گەورە [ف] کلمـۀ احترام به برادر بزرگتر، داداش.

**داشیار:** کەیوانوی ماڵ [ف] کدبانو.

**داشێلان:** لە سەرەوە بۆ خوار بەنهێم دەس پیاهێنان: (پشتمی **داشێلا**) [ف] ماساژ دادن.

**داعبا:** ۱) جانەوەری دڕندە؛ ۲) جانەوەری نەناسراو، داحبا [ف] ۱) دڕنده؛ ۲) جانور شناخته نشده.

**داعوران:** قوتدان [ف] فرودادن، قورت دادن.

**داغ:** ۱) گەرم؛ ۲) خەمو خەفـەت؛ ۳) چزان بەئاسنی سورەوەبو [ف] ۱) داغ؛ ۲) غم، اندوه؛ ۳) داغ کردن با آهن سرخ شده.

**داغان:** بەرباد، تەرتو تونا، تەفرو تونا [ف] داغان.

**داغدیە:** بەلا بەسەرهاتگ [ف] مُصیبت دیده.

**داغمە:** مۆری دەولەتی، تەمغە [ف] مهر دولتی.

**داف:** ۱) داو؛ ۲) گرفتاری [ف] ۱) دام؛ ۲) گرفتاری.

**دافرتان:** لێ دەرپەڕین [ف] بیرون جهیدن.

**دافرتانن:** لەناوەوە دەراویشتن [ف] به بیرون ورجهاندن.

**دافرەقان:** داپلۆخان [ف] له شُدن از شدّت پُختن.

**دافرەقانن:** داپلۆخاندن [ف] له کردن.

**دافرەقیان:** داپلۆخان [ف] نگا: داپلۆخان.

**دافرەقین:** دافرەقیان [ف] له شُدن از شدّت پُختن.

**دافلیقان:** پلیشانەوە [ف] له شُدن، ازهم گسیختن.

**دافەتان:** داپلۆخان [ف] لەشدن و ازهم گسیختن از شدت زخم.

**دافەتاو:** داپلۆخاو [ف] لەشده از شدت زخم و بیماری.

**دافەتین:** دافەتان [ف] نگا: دافەتان.

**داڤ:** داو [ف] دام.

**داڤـدۆز:** ۱) کەوی لەداو ترسـاو کە تخـونی داو ناکەوێ؛ ۲) برێتی لە فیڵبـازو زرنگ [ف] ۱) کبـکی که از دام ترسیده و طـرف آن نمی‌رود؛ ۲) کنایه از آدم زیرك و مکّار.

**داڤسك:** داموسك، موی کلکی یەکسم [ف] موی ستور.

**داڤك:** داوی ڕاوەکەو [ف] دامی که برای کبك گذارند.

**داڤـەڕستن:** ۱) خۆپێکـەوە نوسـانـدن. وەك دەنکـە ترێ بەتەنیشت یەکەوە؛ ۲) ڕاسان [ف] ۱) بهم چسبیدن؛ ۲) تهدید با دست.

**داڤەگر:** بەتاسە، بەئاوات [ف] تاسەخوار، آرزومند.

**داڤی:** دوایی، دوماهی، ئاخری [ف] آخری.

**داقرتاندن:** ۱) کرۆژتن؛ ۲) بە ددان شکاندنو بڕین [ف] ۱) خاییدن؛ ۲) با دندان شکستن و بریدن.

**داقرچان:** ترنجان [ف] ترنجیدن.

**داقرچاندن:** هەڵقرچاندن، گرنج کردن [ف] ترنجاندن.

**داقرچیان:** داقرچان [ف] ترنجیدن

**داقڵیشان:** لەسەر بۆخوار درزبردن [ف] ترکیدن از بالا به پایین.

**داقڵیشاندن:** لە سەر بۆخوار لەت کردن، دادڕین [ف] شکافتن از بالا به پایین.

**داقڵیشاو:** لە سەر بۆخوار درزبردو [ف] ترکیده از بالا به پایین.

**داقڵیشیاگ:** داقڵیشاو [ف] نگا: داقڵیشاو.

**داقڵیشیان:** داقڵیشان [ف] نگا: داقڵیشان.

**داقنان:** پلۆخان [ف] لەشدن جسم.

**داقناو:** پلۆخاو [ف] جسم له شده.

**داقنین:** داقنان [ف] نگا: داقنان.

**داقنیو:** داقناو [ف] نگا: داقناو.

**داقورچاندن:** قویتدان، قورچاندن [ف] قورت دادن.

**داقوساندن:** قەیچی کردن [ف] قیچی کردن.

**داقولین:** شکیان [ف] شکستن.

**داقەڵاشتن:** ۱) لە سەر بۆخوار لەت کردنی دار؛ ۲) برێتی لە هەڵاتنی بە بەلە [ف] ۱) فرو شکافتن؛ ۲) کنایه از فرار با شتاب.

**داقەڵشان:** داقڵیشان [ف] نگا: داقڵیشان.

**داقەڵشاندن:** لە سەر بۆ خوار لەت کردن [ف] شکافتن از بالا به پایین.

**داقەڵەشان:** داقەڵشان [ف] نگا: داقەڵشان.

**داقەڵەشاندن:** داقەڵشاندن [ف] نگا: داقەڵشاندن.

**داقەڵەشاو:** داقڵیشاو [ف] نگا: داقڵیشاو.

**داقەڵەشیاو:** داقڵیشاو [ف] نگا: داقڵیشاو.

**داك:** دایك، دێ، دیا [ف] مادر.

**داکاسان:** ئوقرە گرتن، داسەکنان، هەدادان [ف] آرام گرفتن.

**داکاسانن:** داسەکناندن [ف] آرام کردن.

**داکاسیان:** داکاسان [ف] آرام گرفتن.

**داکاسین:** داکاسان [ف] آرام گرفتن.

**داکاڵیان:** نەڕاندن، خوڕین، داخوڕین [ف] غرّیدن، نهیب زدن.

**داکتن:** شۆڕەوەبون، داهێڵان [ف] آویخته شدن.

**داکـردن:** ۱) خەلـە کردنـە ناوچـاڵ: (گەنمەکەم **داکرد**)؛ ۲) داباریني باران: (بـاران **دایکـرد**)؛ ۳) ئاژاڵ کردنـە ژورەوە: (حـەیوانـەکـانم **داکـرد**)؛ ۴) چەقـانـدنی گوێچ لە کـایەدا: (هەڵماتەکەت **داکـە**)؛ ۵) قەڵشاندنی دیوار و... [ف] ۱) غله در چاله ریختن؛ ۲) آغاز بارش باران؛ ۳) دام را در آغل جای دادن؛ ۴) قرار دادن سهم هر بازیکن در محـل خود هنگـام بازی، قـرار دادن چیـزی برای نشـانــەگیری؛ ۵) شکافته شدن دیوار و...

**داکرمان:** بە ددان وردکردنی شتی ڕەق: (قەندەکەی **داکرماند**) [ف] خرد

کردن جسم سخت با دندان.

**داکرماندن:** بە ددان وردکردنی شتی ڕەق ف خرد کردن جسم سخت با دندان.

**داکرماو:** شتێ بە ددان وردکرابێ ف خرد شده با دندان.

**داکرمین:** داکرماندن ف نگا: داکرماندن.

**داکرن:** داکردن ف نگا: داکردن.

**داکروپان:** چاوپۆشی لێ کردن ف چشم‌پوشی.

**داکروژتن:** داکرمان ف نگا: داکرمان.

**داکروشتن:** داکرمان ف نگا: داکرمان.

**داکشان:** بەرەوژێر خشین ف رو بەپایین خزیدن.

**داکشاندن:** بەرە و ژێر ڕەتاندن ف بەزیر کشیدن.

**داکشاو:** ١) بەرەوژێر خزیو؛ ٢) بزاوی ژێری توند لە بن پیت: (پیر کە پیتی «پ» **داکشاوی پێ دەڵێن**) ف ١) رو بە پایین خزیده؛ ٢) حرکت زیر.

**داکشاوی:** ژێری درێژ لە بن پیت ف حرکت زیر بلند در تهجّی.

**داکشە:** ١) بەخشکە بەرەوخوار چون؛ ٢) گەڕانەوەی شەپۆل لە بەست ف ١) خزیدن رو بە پایین؛ ٢) جزر آب.

**داکۆ:** ١) دایك؛ ٢) لە بەر ئەمە، بۆیە ف ١) مادر؛ ٢) بەاین دلیل.

**داکوتان:** ١) بەتهیم بەزەویدادان: (مەزرەقەم **داکوتا**)؛ ٢) سەرێك لەزەوی بردنەخوار: (ئەوسنگەم **داکوتا**)؛ ٣) لە بێژنگ دانی دەغڵ، داتەقانن ف ١) بر زمین زدن با فشار؛ ٢) فروکوبیدن؛ ٣) بە غربال بیختن.

**داکوتاندن:** داکوتان ف نگا: داکوتان.

**داکوژان:** ١) دوایی پێ هێنانی چنراو: (گۆریەکەم بەم گەوە **داکوژاند**)؛ ٢) بڕینەوەی شەڕو کێشە؛ ٣) وەکوژاندنی ئاگر ف ١) خاتمە دادن بافت، کور کردن بافته؛ ٢) پایان دادن بە جنگ و نزاع؛ ٣) خاموش کردن آتش.

**داکوژاندن:** داکوژان ف نگا: داکوژان.

**داکوژانن:** داکوژان ف نگا: داکوژان.

**داکوژیان:** داکوژان ف نگا: داکوژان.

**داکۆکە:** هەراو هوریای ئاپۆرەی مەردم ف جنجال و شلوغی.

**داکۆکی:** ١) پشتیوانی، لاگیری؛ ٢) کۆششت، تەقالا ف ١) طرفداری، پشتیبانی؛ ٢) کوشش.

**داکەتن:** ١) کەوتنەخوار؛ ٢) پەڕینی نێر لە مێ. هەر بۆ *ئاژەڵ ئێژن*؛ ٣) خوار بوونەوە ف ١) پایین افتادن؛ ٢) جفت‌گیری نر و ماده. *برای حیوان می‌گویند*؛ ٣) کج شدن.

**داکەسیان:** داسەکنین، هەدادان ف آرام گرفتن.

**داکەسیای:** داسەکناو ف آرام گرفته.

**داکەسین:** داکەسیان ف آرام گرفتن.

**داکەفتگ:** ١) قوپاو؛ ٢) داهاتوی بان یان زەوی؛ ٣) داب ف ١) فرو رفته؛ ٢) بام یا زمین گود شده؛ ٣) مُد شده.

**داکەفتگی:** قوپانی زەوی یان بان ف گودشدگی زمین یا بام.

**داکەفتن:** ١) لە سەرەوە بەرەوخوار هاتن؛ ٢) کەوتنە خوار؛ ٣) بوئەداب و باو: (شتێ تازە **داکەفتگە**)؛ ٤) داسەکنان: (**داکەفە**)؛ ٥) لەکارکەوتن: (پیر بوە **داکەفتگە**)؛ ٦) قوپانی زەمین یان بان، داهاتن: (بانەکە **داکەفتوە**) ف ١) از بالا رو بە پایین آمدن؛ ٢) بە زیر افتادن؛ ٣) مُد شدن؛ ٤) آرام گرفتن؛ ٥) از کار افتادن؛ ٦) چالەشدن بام یا زمین.

**داکەن:** کەسێ کە بەرگ لە خۆی یان لە کەسێك دەکاتەوە ف کسی کە لباس از تن خود یا دیگری درمی‌آورد.

**داکەناندن:** ژخۆکردنی جلك، لیباس لە بەرخۆداڕنین ف درآوردن لباس.

**داکەندن:** داکەناندن ف درآوردن لباس.

**داکەواندن:** خستنەخوارەوە ف فروهشتن، بەزیر انداختن.

**داکەوتن:** داکەفتن ف نگا: داکەفتن.

**داکەوتو:** داکەفتگ ف نگا: داکەفتگ.

**داکێشان:** ١) لە سەرەوە بەرەوخوارکێشان؛ ٢) ڕاخستن، داخستن ف ١) از بالا بە پایین کشیدن؛ ٢) گستردن.

**داگ:** ١) داین، بەخشین؛ ٢) ناوەوە، گۆڕ: (مبازدا ئەڤ ماڵ **داگی**) ف ١) دادن، بخشیدن؛ ٢) میانە، وسط.

**داگا:** نەنك، داکی داك و باب ف مادربزرگ.

**داگر:** ١) داگیرکەر، دەست بەسەرداگر؛ ٢) هەمولا وەبەرخودەر ف ١) غاصب؛ ٢) شامل، فراگیرندە.

**داگڕان:** وەخوروهاتنی هەمو لەش ف بە خارش افتادن همهٔ تن.

**داگڕاندن:** وەخوروهێنانی لەش لە نەخۆشی ف بە خارش افتادن جسم از بیماری.

**داگڕاو:** لەشی وەخوروهاتگ ف جسم بە خارش افتاده.

**داگرتن:** ١) هێنانەخوار لە سەرەوە؛ ٢) بەهەمولا ڕاگەیشتن؛ ٣) پڕکردنی دەفر؛ ٤) دادرونی کەنارەی جل بەسەر یەکا؛ ٥) لێدانی بێ پسانەوە: (وای بەداران **داگرت** گوتمان دەمرێ)؛ ٦) بەقسەی زۆر سەر گێژکردن: (وای **داگرتم** بەقسە هۆشم نەما) ف ١) پایین آوردن از بالا؛ ٢) فراگیری؛ ٣) پرکردن ظرف؛ ٤) برهم دوختن کنارهٔ لباس؛ ٥) زدن بدون انقطاع؛ ٦) از پرحرفی گیج کردن.

**داگرتنەوە:** ١) دوبارە پڕکردن؛ ٢) بەسەریەکا درونی حاشیەی لیباس ف ١) دوبارە پرکردن؛ ٢) برهم دوزی کنارهٔ لباس.

**داگرتو:** ١) پڕ؛ ٢) هاوردە لە سەر بۆ خوار ف ١) پر، مالامال؛ ٢) پایین آوردە شدە از بالا.

**داگرتی:** ١) پڕ؛ ٢) بریتی لە بادی هەوا، بەفیز ف ١) پر؛ ٢) کنایە از متکبّر.

**داگرسان:** پێ بونی ئاگر، هەڵبون ف مشتعل شدن.

**داگرساندن:** پێ کردن، هەڵکردنی ئاگر ف مشتعل نمودن، افروختن.

**داگرساو:** هەڵبو، ئاگرتێ بەربو ف مشتعل شدە.

**داگریساندن:** داگرساندن ف مشتعل نمودن، افروختن.

**داگوشین:** وشین لە سەرەوە بەرەوژێر ف فشردن از بالا بە پایین.

**داگەڕان:** بەرەو خوارهاتن لە لای سەرەوە ف فرود آمدن از بلندی.

**داگیر:** ۱) داگر؛ ۲) بەزۆر ستێنراو: (ماڵەکەم **داگیر** کراوە) ف ۱) نگا: داگر؛ ۲) غصب شده.

**داگیـران:** ۱) گەرم داهـاتنـی لەش لە تا؛ ۲) گـڕتێ‌چـون، هەڵبـون؛ ۳) گرانبونی گوێ؛ ۴) سورهەڵگەڕانی چاو لە چاوئێشە ف ۱) گرم و سنگین شدن جسم از تب؛ ۲) مشتعل شدن آتش؛ ۳) سنگین شدن گوش؛ ۴) سرخ شدن چشم از چشم‌درد.

**داگیراندن:** داگرساندن ف مشتعل نمودن.

**داگیرانن:** داگرساندن ف مشتعل نمودن.

**داگیـراو:** ۱) کەسێ کە لەشـی لەبەرتا گەرم داهاتبـێ؛ ۲) گڕتێ چو ف ۱) گرم و سنگین شده از تب؛ ۲) مشتعل شده.

**داگیرسان:** داگرسان ف مشتعل شدن.

**داگیرساندن:** داگرساندن ف مشتعل نمودن.

**داگیرسانن:** داگرساندن ف مشتعل نمودن.

**داگیرساو:** داگرساو ف مشتعل شده.

**داگیرکراو:** بەزۆر سێندراو ف غصب شده.

**داگیرکردن:** بەزۆر سەندن ف غصب کردن.

**داگیرکەر:** بەزۆر سێن ف غاصب.

**داگیریان:** داگیرسان ف نگا: داگیرسان.

**داگیریاگ:** داگیراو ف نگا: داگیراو.

**دال:** ۱) جار، کەڕەت، دەفعە؛ ۲) ناوی پیتێ لە ئەلف‌و بێتکە؛ ۳) بەردی نیشـانە لە بەردەفڕکـێ دا ف ۱) دفعـه، بار؛ ۲) نام حَرفـی در الفبـا؛ ۳) سنگ آماج در بازی سنگ‌اندازی.

**داڵ:** ۱) ناوی پیتێ لە ئەلف‌و بێ، دال؛ ۲) خەرتل؛ ۳) دنْك لێك جودا: (ئـەم هێشوە **داڵـە**)؛ ۴) کەم‌و زەبونی: (ئەم چێـڵە **داڵ** گۆشتە) ف ۱) حرف دال؛ ۲) لاشخور؛ ۳) دانه از هم جدا، خوشه؛ ۴) اندکی و لاغری.

**داڵاش:** خەرتل، داڵ ف لاشخور.

**داڵان:** ڕێگەی بە دیواری سەرداپۆشراودا ف دهلیز.

**داڵاندار:** پاسەوانی کاروانسەراو ماڵەگەورە ف سرایدار.

**داڵان دۆرەپ:** ژنی درێژی لاواز ف زن قدبلند بسیار لاغر.

**داڵاهـۆ:** ۱) داڵـۆ، داوەڵ، داڵهـۆ؛ ۲) ناوی کێوێکە لە کـوردستان ف ۱) مترسك؛ ۲) نام کوهی در کردستان.

**داڵبڕ:** بڕشتی کەوانەیی لە جلك دا ف دالبر.

**داڵبون:** لاوازبون، لەڕبون ف لاغرشدن.

**داڵدە:** پەنا ف پناه، لجوء.

**داڵدەدان:** پەنادان، حاواندنەوە لە ژێر پەنای خۆ دا ف پناه دادن.

**داڵدەهێنان:** پەناهێنان ف پناه آوردن، التجاء.

**دالستن:** لستنەوە لە سەر بۆ خوار ف فرولیسیدن.

**دالك:** دایك، دێ، جیا، دیا ف مادر.

**دالکە:** دواندنی دایك ف خطاب به مادر.

**دالکان:** پێوەنوسان، چەسپان بە سەر ف چسبیدن بر.

**دالکاندن:** پێوەنوساندن ف چسبانیدن بر.

**دالکانن:** دالکاندن ف چسبانیدن بر.

**دالکاو:** پێوەنوساو ف چسبیده بر.

**داڵکەدزان:** دەس‌کیس، هاوکاری نهێنی دز، دەلاڵی دز ف دزد افشار.

**دالکیاگ:** دالکاو ف چسبیده بر.

**دالکیان:** دالکان ف چسبیدن بر.

**داڵگە:** شار لە گەمە دا ف آخرین مرحله در بازی دویدن و...

**دالو:** داڵان ف دهلیز.

**داڵۆ:** پیرێژنی ناحەزی چرچ ف پیرزن بدقیافه.

**داڵۆ:** پەیکەرەی لەپوش‌و پەلاش لەمەزرا بۆ چوێلەکە ترساندن، داوەڵ، داهۆڵ ف مترسك.

**داڵوت:** داربەست ف چوب‌بست.

**داڵوچان:** شۆڕبونەوە ف فروهشتگی.

**داڵوچانن:** شۆڕکردنەوەو... داهێشتن ف فروهشتن.

**داڵوچکە:** داهێڵراو، شۆڕەوەکراو ف فروهشته.

**داڵوچە:** داڵوچکە ف فروهشته.

**داڵوچیان:** داڵوچان ف نگا: داڵوچان.

**داڵۆزان:** داڵوچان ف نگا: داڵوچان.

**داڵوزکە:** داڵوچکە ف نگا: داڵوچکە.

**داڵۆسکە:** چلۆرە، شوشە سەهۆڵ ف دنگاله.

**دالەقان:** هەڵواسین ف آویختگی.

**دالەقاندن:** هەڵاوەسین، شتێ بە شتی بلندەوە کردن ف آویختن.

**دالەقاو:** هەڵواسراو ف آویخته.

**داڵهۆ:** داڵۆ ف مترسك.

**دالەواروتە:** گوندێکی کوردستانە بەعسی وێرانی کرد ف نام روستایی که بعثیها ویران کردند.

**دالـەوای‌سەروُ:** گونـدێکی کوردستـانـە بەعسی وێرانی کرد ف نام روستایی که بعثیها ویران کردند.

**دالـەوای‌گردان:** گونـدێکی کوردستـانـە بەعسی وێرانی کرد ف نام روستایی که بعثیها ویران کردند.

**داڵەهۆ:** داوەڵ، داڵۆ ف مترسك.

**دالیان:** لاساری، سوُر بوُن لەسەر مەبەست ف لجاجت.

**داڵیت:** داربەست بۆ مێوەرەزو شتی تر ف چوب‌بست.

**دالیستن:** دالستن ف لیسیدن.

**داڵیە:** سی پێوانە لە خەرمان کە لە دارلەلە دەکرێ ف سی پیمانه از خرمن.

**دام:** ۱) کردەی ڕابردو لە دان، بەخشین؛ ۲) داوی ڕاو؛ ۳) جێگەی ئاغا لە تەختە دامە دا؛ ۴) برێتی لە دەوڵەمەندی زۆر؛ ۵) ڕەوشتی ناو کۆمەڵ: (دام‌و دەستـور)، داب ف ۱) فعل ماضی از دادن برای اوّل شخص مفرد؛ ۲) دام، تله؛ ۳) بالاترین خانه در عرصهٔ بازی «داما»؛ ۴) کنایه از ثروت زیاد؛ ۵) عرف و عادت.

**دامـا:** ۱) مات بو، کەوتە هەرزەوە؛ ۲) گەمەیەکە هەواڵی شەترنج ف ۱) حیران شد؛ ۲) نوعی بازی شبیه شطرنج.

**دامار:** رەگی ئەستور، دەمار ف رگ قطور.

**داماری:** زڕدایك، باوەژن ف زن‌پدر.

**داماك:** زڕدایك، ژن‌باف ف نامادری.

**داماگ:** ماتو سەرگەردان، تێماو ف درمانده، مات.

**داماگی:** تێماوی، ماتیو سەرگەردانی ف درماندگی.

**دامـالان:** ۱) لە سەرەوە بۆ خوار داخـزانـدن: (پێستی لە بەر **دامالە**)؛ ۲) شێلانی بە دەست: (تـۆزێك پشتم **دامـالــە**)؛ ۳) داکـەنـدن: (دەرپێکـەی **دامـالی**)؛ ۴) لیس‌دانی مەنجەڵو دیزە بە دەست: (ئەو دیزە چی پێوەمـاوە **دای‌مـالـە**) ف ۱) فـر وکنـدن لبـاس؛ ۲) ماسـاژ دادن؛ ۳) خزانیدن لباس؛ ۴) لیس‌دادن تەدیگ با دست.

**دامالاو:** دامالدراو، وشەی بەرکار لە دامالان ف صیغهٔ مفعولی «دامالان».

**دامالدراو:** دامالاو، دامالیاگ ف نگا: دامالاو.

**دامالیاگ:** دامالاو ف نگا: دامالاو.

**دامالیان:** دامالان ف نگا: دامالان.

**دامالین:** دامالان ف نگا: دامالان.

**دامالیو:** دامالاو ف نگا: دامالاو.

**دامـان:** ۱) تـێ‌مان، ماتـیو سەرگەردانی، دامـاگی؛ ۲) داویـن، چاك؛ ۳) نامانە ناودەستی، بەخشیمان ف ۱) درماندن؛ ۲) دامن؛ ۳) دادیم.

**دامانێ:** ۱) گەمەی دامە؛ ۲) بەومان دا ف ۱) بازی «داما»؛ ۲) بەوی دادیم.

**داماو:** داماگ ف درمانده.

**داماوی:** ۱) داماگی؛ ۲) مات‌بوون ف ۱) درماندگی؛ ۲) درمانده شدن.

**دامای:** ۱) داماو؛ ۲) مات‌بوی ف ۱) درمانده؛ ۲) درمانده شدی.

**دامران:** تەمران، کوژانەوەو خەفەبونی ئاگر ف فروکش کردن و خاموش شدن آتش.

**دامردن:** دامران ف نگا: دامران.

**دامردنەوە:** دامردن ف نگا: دامردن.

**دامـرکـان:** ۱) داسەکنان، هەدادان؛ ۲) نەمانی گڕی ئاگر ف ۱) آرام گرفتن؛ ۲) فروکش کردن شعله.

**دامـرکـانـدن:** ۱) داسەکناندن، آرام کردن؛ ۲) گڕنەهێشتنی ئاگر ف ۱) آرام کردن؛ ۲) فروکشانیدن لهیب.

**دامرکانن:** دامرکاندن ف نگا: دامرکاندن.

**دامرکیان:** دامرکان ف نگا: دامرکان.

**دامرکین:** دامرکان ف نگا: دامرکان.

**دامشتە:** دانەوێڵە لە سەر ساج برژێنراو، برێشکە، بۆدراو ف دانهٔ بوداده.

**داملە:** شەپلە لێدراو، ئیفلیج ف فالج‌زده.

**داملەچەقان:** نوەگوان، نێنگوین، مانگای بەرکەڵ، چێڵی سێ‌ساڵان ف مادە گاو سە سالە.

**دامنەچەقان:** داملەچەقان ف نگا: داملەچەقان.

**دامو:** دامان، داوێن ف دامن.

**دامـۆچـانـن:** ۱) دنـەدان، هانەدان؛ ۲) ڕام‌کردن ف ۱) برانگیختـن؛ ۲) رام‌کردن.

**دامـۆچـانن:** وەرگەڕاندنی قەراغی لیباس بۆ دەرەوە ف برگرداندن لبهٔ لباس و فرش و...

**دامـۆچـیـاگ:** ۱) دنـەدراو؛ ۲) لێـوهـەڵـگـەڕاوە؛ ۳) ڕام‌کراو ف ۱) برانگیخته؛ ۲) لبه برگشته؛ ۳) رام شده.

**دامو دەزگـــا:** ۱) کۆشـك، قەسـر، خانـوی بەرزو تەرز؛ ۲) برێتی لە دەوڵەتو ئیدارەکانی؛ ۳) خۆش‌ڕابواردن ف ۱) کاخ مجلّل؛ ۲) کنایه از رژیم و بستگان آن، سازمان؛ ۳) خوشگذرانی.

**دامو دەستور:** تەکوزی، ڕێکو پێکی ف ترتیب و تنظیم.

**داموس:** موی کلکی یەکسم ف موی دم ستور.

**داموسك:** داموس ف نگا: داموس.

**داموسکە:** داموس ف نگا: داموس.

**دامە:** گەمەیەکە بە سیو دو داش دەکرێ ف بازی «داما».

**دامەرزان:** جێ گرتن، جێ بونەوە لە شوێنێ ف جایگیر شدن.

**دامەرزاندن:** جێگیرکردن ف جایگیر کردن.

**دامەرزانن:** دامەرزاندن ف جایگیر کردن.

**دامەرزاو:** جێگیر بوگ ف جایگیر شده.

**دامەرزیاگ:** دامەرزاو ف جایگیر شده.

**دامەرزیان:** دامەرزان ف جایگیر شدن.

**دامەزران:** دامەرزان، تەواو وەك یەك دەگەڵ دامەرزان ف نگا: دامەرزان.

**دامەزراندن:** دامەرزاندن ف جایگیر کردن.

**دامەزراو:** دامەرزاو ف جایگیر شده.

**دامەلاغاس:** تالان کراو، پوڕکری ف غارت شده.

**دامەن:** دامان، چاك، داوێن ف دامن.

**دامەهر:** زڕداك، باوەژن ف نامادری.

**دامێن:** ۱) دامەن؛ ۲) داوێنی کێو، بنار ف ۱) دامن؛ ۲) دامنهٔ کوه.

**دامێن‌پیس:** مرۆی زیناحکار ف فاسق، زانی، آلوده دامن.

**دامێن تەڕ:** دامێن پیس ف نگا: دامێن‌پیس.

**دامێن گرتن:** ۱) برێتی لە پەنـابۆ بردنو تکاکردن لەکەسێ؛ ۲) ناچار توشی بەڵابون: (ئەم بەڵایە **دامێنی گرتوم**) ف ۱) کنایه از التماس و پناه خواستن؛ ۲) گرفتار شدن.

**دامێنگیر:** یەخەگر، توش‌هاتو ف گریبانگیر.

**دان:** ۱) داین، بەخشین؛ ۲) خۆراکی مریشكو باڵندەی ماڵی؛ ۳) خەلە: (دەخلو **دان**)؛ ۴) تۆم: (گەنمـەکـەم **دانی** نەگرتوە)؛ ۵) ددان، دران؛ ۶) جێگـە: (**خـوێدان، قەلاغدان**)؛ ۷) نیشـانـەی چاوگ: (**پێدان، لێدان، تێدان**)؛ ۸) نیوڕۆژ: (**دانی** سەرینە، **دانی** ئێوارە)؛ ۹) وەنـاو کەوتن: (**لەناودان**)؛ ۱۰) کژ، فەسڵ ف ۱) دادن؛ ۲) خوراك ماکیان، چینـه؛ ۳) غلّه؛ ۴) تخم؛ ۵) دنـدان؛ ۶) پسوند ظرفیّت؛ ۷) علامت مصدری؛ ۸) نیم‌روز؛ ۹) بەمیان رفتن؛ ۱۰) موسم.

**دان‌ئاڵبونەوە:** ددان بەشتی ترش کولبون ف کند شدن دندان از ترشی خوردن.

**دانا:** زانا، زۆرزان ف دانا.

**دانــار:** تیکه‌ڵاو نه‌بوی ده‌نکه‌ده‌نکه‌ی داوه‌ستاو: (چێشته‌که **دانار دانار** بیو) ف دانه‌دانه شدن روغن و...

**داناردانار:** دانار ف نگا: دانار.

**داناژن:** پوشکه‌ی که‌لێنه‌ددان کوڵینه‌وه ف خلال دندان.

**دانامه:** ماش و برنج، موی سپی و ڕه‌شی تیکه‌ڵاو ف موی سپید و سیاه سر و روی.

**دانان:** ۱) نانه‌سه‌رزه‌وی؛ ۲) دۆڕاندن له قومار؛ ۳) نوسینی کتێب: (مه‌لا کتێبێکی **داناوه**) ف ۱) نهادن؛ ۲) باختن؛ ۳) تألیف کردن.

**داناو:** ئاودانی ده‌غڵ بۆ ده‌نك قه‌ڵه‌وبون ف آبیاری برای چاق شدن دانهٔ غلّه.

**دانبۆری:** زۆرخۆر دوای له نه‌خۆشی هه‌ستانه‌وه ف پرخوری بعد از شفا یافتن.

**دان‌به‌خۆداگرتن:** ده‌رهه‌ڵ نه‌بوُن، پشودرێژی، له پڕ هه‌ڵنه‌چوُن ف صبر و حلم داشتن.

**دان‌بیانان:** ۱) ڕاستی گوتن، ده‌ربڕینی جوابی ڕاست؛ ۲) به‌شت زانین، نرخ‌بۆدانان: (کاو را **دان** به منا **ناهێنێ**) ف ۱) اعتراف؛ ۲) ارج نهادن.

**دان‌جیرکردن:** ددان به گڕی شاندان ف دندان قروچه.

**دان‌جیرکردنه‌وه:** دان‌جیرکردن ف دندان قروچه.

**دان‌چونه کلیله:** ددان به سه‌ریه‌ك دانوسان و زار هه‌ڵنه‌پچڕان ف دندان برهم چسبیدن و باز نشدن دهان، قفل شدن دهان.

**دان چیرکردن:** دان جیرکردن ف دندان قروچه.

**دان‌دانۆکه:** گیایه‌که ف گیاهی است.

**دانــدراو:** ۱) ســه‌رزه‌وی نــراو؛ ۲) کریــاو به قــانــون؛ ۳) هه‌ڵگیراو ف ۱) نهاده شده؛ ۲) قانون شده؛ ۳) در خانه نگهداری شده.

**داندۆك:** گه‌نم و دۆکه‌شکی وشکه‌وه‌کراو ف گندم و دوغ کشك باهم خشکیده.

**داندوك:** ده‌می باڵنده، ده‌نوك ف نوك، منقار.

**دانراو:** داندراو ف نگا: داندراو.

**دان‌ڕیچ:** ددان‌گڕ ف دندانها برجسته.

**دان‌ڕیچ کردنه‌وه:** دان‌جیرکردن ف دندان قروچه.

**دانساز:** وه‌ستای ددان کردن ف دندانساز.

**دان سپی بونه‌وه:** بریتی له بێ‌شه‌رم بون ف کنایه از شرم و حیا رفتن.

**دانسته:** تایبه‌تی ف ویژگی.

**دانسقه:** که‌م‌وێنه، نایه‌ب ف نایاب.

**دان‌سه‌ح کرن:** تێ گه‌یاندن ف فهمانیدن.

**دانك:** ده‌نك، دانه، لب ف دانه.

**دانکردن:** ۱) ده‌نك په‌یدابونی خه‌ڵه؛ ۲) ددان دروست کردن ف ۱) دانه کردن غلّه؛ ۲) دندان درست کردن.

**دانکه:** ئاوڵه‌ی مه‌ل، خروُکه‌ی مریشك ف آبله‌مرغان.

**دانکه‌ده‌ردان:** ئاوڵه لێ هاتنی مه‌ل و مریشك ف آبله‌زدن مرغ.

**دان‌که‌ل:** دگان شکیاگ یاکه‌فتگ ف دندان شکسته.

**دانــگ:** ۱) شه‌شیه‌کی موڵــك؛ ۲) شه‌شیه‌کی مسقاڵ ف ۱) یك ششم ملك؛ ۲) یك ششم مثقال.

**دانگا:** ده‌مێك، تاوێك ف مدّتی کم، دمی.

**دانگانه:** به‌هره‌ی دانگێك له مڵك ف بهرهٔ یك ششم از زمین ملکی.

**دانگــو:** ۱) کاکڵه بـادام و شیـڵانه‌ی سپی کراوی کوڵاو؛ ۲) جیاجیا ف ۱) هستهٔ بادام و زردآلوی پوست کندهٔ آب پز؛ ۲) متفرّق.

**دانگه:** ۱) جێگه‌ی گیابۆخستنی ئاژه‌ڵ له زستاندا؛ ۲) خوار ئاوایی ف ۱) علفگاه بیرون آغل در زمستان؛ ۲) طرف پایین آبادی.

**دانـگیـر:** ۱) دانــه‌وێڵــه‌ی باش نه‌کــوڵاو؛ ۲) چیکــه‌نـه، ئامـرازی په‌مۆدانه‌گرتن؛ ۳) نه‌خۆشی ئاژه‌ڵ له ده‌خڵی زۆر خواردن ف ۱) دانهٔ نیم‌پخته؛ ۲) ابزار پنبه پاك کنی؛ ۳) نوعی بیماری دام که از خوردن غلّهٔ بسیار حاصل می‌شود.

**دان تیژ کردن:** بریتی له ته‌ماح کردن ف کنایه از طمع.

**دانـو:** ۱) دانـه‌وێڵه‌ی له ئاوا کـوڵاو؛ ۲) جـۆره نه‌خـۆشیـه‌کـی بزن؛ ۳) چواڵه‌ی سپی کـراوی کـوڵاو ف ۱) دانهٔ آب‌پز؛ ۲) نوعی بیماری بز؛ ۳) هسته بادام آب‌پز.

**دانواندن:** ۱) چه‌ماندنه‌وه؛ ۲) بریتی له ته‌سلیم بون ف ۱) خم کردن؛ ۲) کنایه از تسلیم شدن.

**دانوراشتن:** قه‌دکردن، دولا به‌سه‌ریه‌کاهێنان ف تاکردن، دولایه برهم آوردن.

**دانوستان:** مامڵه، کڕین و فرۆتن ف معامله.

**دانوشتان:** قه‌دبون، لایه‌ك به‌سه‌ر یه‌کتر داهێنان ف تاشدن، لابرلا آوردن.

**دانوشتاندن:** دانوراشتن ف نگا: دانوراشتن.

**دانوشتانن:** دانوشتاندن ف نگا: دانوشتاندن.

**دانـوشتـاو:** ۱) قه‌دکـراو؛ ۲) که‌ناره‌ی به‌سه‌ریه‌کا دوراو ف ۱) تاشدهٔ کاغذ؛ ۲) برهم دوختهٔ کنارهٔ لباس.

**دانۆکه:** تۆی که‌نگر، تۆمی ناو قانگه‌لاشك ف کنگردانه.

**دانوکه:** نه‌خۆشیه‌کی مه‌له ف نوعی بیماری پرنده.

**دانوله:** ۱) دانه‌وێڵه‌ی کوڵاو؛ ۲) گیایه‌که ف ۱) دانهٔ آب‌پز؛ ۲) گیاهی است.

**دانــه:** ۱) دانك، ده‌نك، ده‌ندك؛ ۲) هاوکاری ژماره، عه‌دده‌د: (**یه‌ك‌دانه، دودانه**)؛ ۳) ئاسنی لغاو که ده‌چێته ناو زاری یه‌کسمه‌وه؛ ۴) ته‌خته‌ی لای ژووروی مه‌ره‌زه؛ ۵) ددانه‌و گڕنی گڕنیایه‌تی مشار و هه‌ڕه؛ ۶) شه‌ی ته‌ون؛ ۷) ده‌رمـانی ڕه‌نگ بۆ ڕه‌نگ‌کردنی به‌ران؛ ۸) تانه‌ی چاو؛ ۹) به‌ردێکی به نرخـه ف ۱) دانـه؛ ۲) عدد؛ ۳) دهنـهٔ لگام؛ ۴) قسمت بالای شالیزار؛ ۵) دندانه؛ ۶) شانه مانندی در بافندگی؛ ۷) رنگی که برای رنگ کردن قوچ به‌کار می‌رود؛ ۸) لکهٔ چشم؛ ۹) یشم.

**دانه‌با:** به‌ربادانی خۆیانی خه‌رمان ف باد دادن خرمن.

**دانه‌به‌ر:** ده‌سته‌به‌ر، به‌رعۆده ف ضامن.

**دانه‌به‌رهه‌ڤ:** له‌به‌رانبه‌ر یه‌کتر ڕانان تا بزانن کام باشتر و جوانترن ف رو در رو قرار دادن برای مقایسه.

**دانەپاڵ:** ١) هاوبەشی کردن، تێکەڵ بە خەڵکبون بۆ کاریێ؛ ٢) بە بنار هەڵگەڕان ف ١) رفتن به همکاری دیگران؛ ٢) از دامنه بالا رفتن.

**دانەپەی:** وەدواکەوتن ف پیگیری.

**دانەچوقە:** تەقەتەقی ددانان لە سەرمان یان لە تالێهاتن ف بهم خوردن دندانها از سرما یا از تب.

**دانەچولەکە:** گیایەکە ف گیاهی است.

**دانەچیرە:** زیك خشانی ددانانو سیرە لێ هاتنیان ف بهم ساییدن دندانها.

**دانەخورە:** چەشە خواردو، چەشە ف چشته‌خوار.

**دانـەدو:** ١) لـەدودان، پێـوەچـون؛ ٢) وەدواکـەوتن، شوێـن کەوتـن؛ ٣) مریـدبون، پەیـڕەوی کـردن ف ١) استمرار، ادامـه؛ ٢) پیگیری؛ ٣) پیروی.

**دانەدۆ:** دۆکولێو، دۆخەوا ف دوغبا.

**دانەدەم:** لەدوادان ف تمدید کردن، ادامه دادن.

**دانـەر:** ١) کەسێ شتێ ئەنێتـە بان زەوی یا هەرشتێ؛ ٢) بناغە دارێژو دوروستکەر؛ ٣) نوسەری کتێبو شێعر ف ١) گذارنده؛ ٢) بنیانگزار؛ ٣) مؤلف.

**دانەڕۆکە:** شێوی نۆکو گەنم کە بە مزگێنی دانهاتنی منداڵ دەیبەشنەوە ف آش گندم و نخود که بەمناسبت دندان درآوردن نوزاد می‌دهند.

**دانەریز:** دانەڕژانە ناو ئاردەوە لە ئاسیاو ف دانە گندمریزی در آرد آسیاب.

**دانەزانین:** تێگە یاندنی خەڵك بۆفەرمان وکاریێ ف اعلام.

**دانەسەر:** بەسەردا دان، هێرش لەنەکاو بۆ بردن ف حمله کردن.

**دانەقەتێ:** گیایەکە ف گیاهی است.

**دانەك:** بەخشش ف بخشش.

**دانەکولانە:** دانوی دانەوێڵە، دانوڵە ف دانهٔ آب‌پز.

**دانەلغاو:** ئەو ئاسنەی لغاو کە دەچێتە ناو دەمی یەکسم ف دهنهٔ لگام.

**دانەلوق:** شێوی سەوزیجاتو گەنمەکوتاو ف آش سبزی و گندم نیم‌کوب.

**دانەماش:** موی ماشو برنجی ف موی سپید و سیاه مختلط.

**دانەمە:** موی سپی دانە دانە لە ناو موی ڕەش دا ف تارهای سفید مو در ریش.

**دانەوان:** چەمینەوە، بەرەو نەوی بون ف خم شدن.

**دانـەوانـدن:** ١) چەمـانـدنەوە؛ ٢) لە کێشەدا تەسلیم بون ف ١) خم نمودن؛ ٢) در مجادله تسلیم شدن، کوتاه آمدن.

**دانەوانن:** دانەواندن ف نگا: دانەواندن.

**دانـــەوە:** ١) گەڕانـــدنـــەوەی وام؛ ٢) کوڵـینی زەمین ف ١) وادادن، بازپرداخت وام؛ ٢) کندن زمین.

**دانەوی:** لارەوەبو، چەمایەوە ف خم شد.

**دانەوێڵە:** ئازوخەی وشك وەك نیسكو نۆكو... ف بنشن.

**دانەوین:** دانەوان ف خم‌شدن.

**دانەوینەوە:** دانەوان ف خم‌شدن.

**دانهێڕ:** گەنمەکوتاو، گەنمی کڕەکراو ف گندم کوبیده.

**دانهێڕك:** دانهێڕ ف گندم کوبیده.

**دانەیەك:** ١) دانەپاڵ؛ ٢) یەکێك ف ١) نگا: دانەپاڵ؛ ٢) یکعدد.

**دانی:** ١) دابەستە؛ ٢) دانو، دەنکی کولاو؛ ٣) دانە بەهەمو ماناوە ف ١) پروار؛ ٢) دانهٔ آب‌پز؛ ٣) نگا: دانه.

**دانـێ:** ١) بنێ بـان زەوی؛ ٢) چێـشتـەنگـاو ف ١) بنـه، بر زمین نه؛ ٢) چاشتگاه.

**دانیاگ:** دوڕاو ف باخته.

**دانیان:** ١) دانان؛ ٢) دوڕاندن ف ١) نهادن؛ ٢) باختن.

**دانیاو:** ١) دانراو؛ ٢) دوڕاو ف ١) نهاده؛ ٢) باخته.

**دانێر:** ئەوی حوکم دەکا، حاکم ف حاکم.

**دانێر کرن:** محاکەمە کردن ف محاکمه کردن.

**دانیش:** ڕونێ، بنیش ف بنشین.

**دانیشتگ:** نیشتو ف نشسته.

**دانیشتن:** ڕونیشتن، نیشتن ف نشستن.

**دانیشتو:** ڕونیشتی، نیشتو ف نشسته.

**دانیشە:** ڕونێ، دانیش ف بنشین.

**دانیك:** دانو، دانولە، دانەوێڵەی کولاو ف دانهٔ آب‌پز.

**دانین:** دانان ف نگا: دانان.

**دانیە:** دایبنێ ف بنه، امر به نهادن.

**داو:** ١) هەودا، تا، تاڵ؛ ٢) داوی مەل ڕاوکردن؛ ٣) گزیو گەڕ؛ ٤) داوێن؛ ٥) جۆرێك کایە لە نەردێندا؛ ٦) گوندێکی کوردستانە بەعسی وێرانی کرد ف ١) تار نخ یا مو و...؛ ٢) دام؛ ٣) حقـه و کلك؛ ٤) دامن؛ ٥) نوعی بازی نرد؛ ٦) نام روستایی در کردستان که بعثیها ویران کردند.

**داوا:** ١) تەڵەب، خوازتن؛ ٣) شەڕوهەرا ف ١) طلب؛ ٢) دعوی، جنگ.

**داواچی:** تەڵەبکار، خوازەر ف ادّعاکننده.

**داواکار:** داواچی ف ادّعاکننده.

**داواکەر:** داواچی ف ادّعاکننده.

**داوان:** ١) دامـەن، دامـێـن، داو؛ ٢) خـوازبـێـنـی کەر ف ١) دامـن؛ ٢) خواستگار.

**داوباز:** ١) گزیکار؛ ٢) ڕاوچی بەهۆیداو ف ١) حقەباز؛ ٢) صیاد بادام.

**داوبسەت:** سەودا، مامڵە ف دادوستد.

**داوخـواز:** ١) خواستنـی خـوێی؛ ٢) خـوازبێنـی کەر ف ١) داوطلـب؛ ٢) خواستگار.

**داوخوازی:** خوازبێنی ف خواستگاری.

**داواخستن:** داودانانەوە بۆ ڕاوەمەل ف دام نهادن.

**داوداوا:** گوندێکە لە کوردستان ف نام روستایی است.

**داوداوی:** جاڵ جاڵۆکە، کاکڵە مۆشان ف عنکبوت.

**داودۆز:** مەلێ کە هەست بە داو دەکا ف پرندەای که دام را حسّ می‌کند.

**داودەرمـان:** ١) هاتـوچـوی بژیشـك کردن بۆ چابونەوە؛ ٢) ئالاتو زەردەچێوە ف ١) معالجات؛ ٢) دیگ ابزار، ادویه.

**داودی:** گوڵێکە بە زور ڕەنگ ف گل داودی.

**داودیرۆنکل:** پەپوسێمانە ف هدهد.
**داوڕ:** داد ڕ، دابڕ، پاژبوگ ف جزء جداشده.
**داوشکەستی:** دامێن تەڕ ف نگا: دامێن تەڕ.
**داوکەفتن:** کەوتنەناو داو، گیران بە داو ف در دام افتادن.
**داوگە:** جێداو، ئەو شوێنەی داوی بۆ ڕاو لێ بنێنەوە ف دامگە.
**داوڵ:** داوەڵ ف مترسك.
**داوڵین:** ۱) نان دەشۆر با گوشین؛ ۲) دەسەریەك ئاخنین ف ۱) تریت کردن نان؛ ۲) انباشتن با فشار.
**داولێدەر:** ۱) داوچەقێن؛ ۲) فێڵباز ف ۱) دام‌گذار؛ ۲) حقه‌باز.
**داونانەوە:** داو چەقاندن بۆ ڕاو ف دام نهادن.
**داوەت:** ۱) ڕەقس، گـۆبـەنـد، دیـلان؛ ۲) زەمـاوەنـدی بوك ف ۱) رقص؛ ۲) جشن عروسی.
**داوەتەجنۆکە:** باهۆز، گێژەلۆکە ف گردباد.
**داوەتی جندۆکان:** باهۆز ف گردباد.
**داوەران:** لە ژوروژا بەرەوخوار ڕژان ف فروریزی.
**داوەراندن:** لە بەرزەوە ڕژاندنەخوار: (سێو **داوەرین**، تەرزە **داوەری**) ف فروریختن.
**داوەرانن:** داوەراندن ف فروریختن.
**داوەریـان:** ۱) داوەران؛ ۲) شـۆڕەوەبـون ف ۱) نـگـا: داوەران؛ ۲) فروهشتگی.
**داوەڕێس:** ۱) هاوریشمی نەڕێسـراو؛ ۲) جۆرێ کوتاڵ ف ۱) ابریشم خام؛ ۲) نوعی کرباس.
**داوەرین:** داوەریان ف نگا: داوەریان.
**داوەزان:** داخۆزین، پیادەبونی سوار ف پیاده شدن سوار.
**داوەزانـدن:** پیادەکـردنی سوار، سوار لە ئەسپ هێنـانە خوار ف پیاده کردن از سواری.
**داوەزین:** داوەزان ف نگا: داوەزان.
**داوەستن:** ۱) دابەستن، شەتەك‌دان؛ ۲) بەختە ڕاگرتن بۆ قەڵەوبون ف ۱) محکم بستن؛ ۲) نگهداری حیوان برای چاق شدن.
**داوەسین:** کەردار، چاروێدار، خەربەندە ف خربنده.
**داوەشان:** ۱) تەکاندنی جلك لە سەر تەندور: (کراسەکەت **داوەشێنە**)؛ ۲) ڕاتڵەکـانـدن بەرەوژێر: (دارێکـی بۆ **داوەشـانـد** بەری نەکـەوت)؛ ۳) ڕزاوی لەبەریەك‌چوگ: (لەشی **داوەشاوە** ناتوانێ هیچ‌بکا) ف ۱) تکانیدن لباس بر آتش؛ ۲) حرکت دادن رو به پایین؛ ۳) لەشدن و پوسیدن.
**داوەشاندن:** کاری داوەشان ف عمل «داوەشان».
**داوەشاو:** بەرکاری داوەشان ف صیغهٔ مفعولی «داوەشان».
**داوەشیاگ:** ۱) داوەشاو؛ ۲) تۆی چێندراو ف ۱) نگا: داوەشاو؛ ۲) تخم کاشته.
**داوەشیان:** داوەشان ف نگا: داوەشان.
**داوەکۆستە:** باڵدارێکە لە کەو بچوکتر ف پرنده‌ای است کوچکتر از کبك.

**داوەڵ:** ۱) داڵـەهۆ، داوڵ، داڵۆ: (بەو زولفی میرۆوەحەت مەکە مەنعم لە شەهـدی لێو / تەیرێکـە دڵ زەعیف‌و دەترسێ لە **داوەڵێ**) «سەیفی قازی»؛ ۲) دەهۆڵ ف ۱) مترسك؛ ۲) دهُل.
**داوی:** دوایی، پاشین ف آخر.
**داویتی:** گوڵێکە بۆن خۆش، داودی ف گل داودی.
**داوی‌دان:** دوایی پێ هێنان ف خاتمه دادن.
**داوین:** پاشین، پاشینە ف آخرین.
**داوێن:** داو، دامان، دامێن ف دامن.
**داوێن‌پاك:** دور لە گوناح ف پاکدامن.
**داوێن پیس:** فاسق‌و زیناح کار، دامێن پیس ف آلوده‌دامن.
**داوێن‌تەڕ:** دامێن تەڕ، داوێن پیس ف تردامن.
**داوینە:** پاشینە، پاش هە موشت ف آخرین.
**داوێنە:** بناری چیا ف دامنهٔ کوه.
**داویە:** هە میشەژیو، بەردەوام ف ابدی.
**داهات:** دەرامەت، بەهرەی زەمین، حاسڵات ف محصول.
**داهاتانە:** بەشی خاون‌مڵك لە دەرامەتی زەوی ف مالیات بر درآمد، بهرهٔ مالکانه.
**داهاتگ:** تازە پەیابوگ ف نوآمده.
**داهـاتن:** ۱) نەوینەوە، چەمینەوە؛ ۲) بڕانەوە بە مشار؛ ۳) نەخۆش بونی چاو: (چاوم **داهاتوە**)؛ ۴) بەشانەکران: (سەری بە شانە **داهاتوە**)؛ ۵) کەوی بون، ڕام‌بون؛ ۶) تازە دەرچـون، لەنـوێ هاتن؛ ۷) داکەوتن: (بـانی ئەو خانـوەی **داهـاتوە**) ف ۱) خمیدن؛ ۲) بریدن با ارّه؛ ۳) شروع چشم‌درد؛ ۴) شانه شدن مو؛ ۵) رام شدن؛ ۶) نوآمد، اختراع؛ ۷) نگا: داکەوتن.
**داهاتو:** حاڵی بەرکاری داهاتن ف صیغهٔ مفعولی «داهاتن».
**داهاڕین:** وردکردنی شتی ڕەق، آسیاوکردن ف خُرد کردن، آسیاب کردن.
**داهانین:** تازە پەیدا کردن، وەدی هێنانی شتی نوێ ف اختراع، نوآوری.
**داهـاوردن:** ۱) داهـانین؛ ۲) بەشانەکردنی مو ف ۱) نگـا: داهـانین؛ ۲) شانه زدن مو.
**داهوڕ:** فرت، گوشاد، هەراو، زڕ، زڕت ف گشاد.
**داهوڵ:** داوەڵ ف مترسك.
**داهەڕستن:** بەسەر یەکدا لکان‌و لێك توندبون ف با فشار برهم چسبیدن.
**داهی:** ئیتر چی؟ دەی ئیدی؟ ف دیگر چه؟ پس چه؟
**داهیـزان:** ۱) لەش گـران‌بون لە تا یان لە گەرما؛ ۲) شـل‌بونی هەویر ف ۱) تباسیدن، بی‌حال شدن از گرما؛ ۲) آبکی بودن خمیر.
**داهێزران:** داهێزان ف نگا: داهێزان.
**داهێزیان:** داهێزان ف نگا: داهێزان.
**داهێشتن:** بەرەوخوار شۆڕکردنەوە ف فروهشتن.
**داهێڵان:** داهێشتن ف فروهشتن.
**داهێنان:** ۱) ڕام‌کردن، کەوی کردن، کەدی کردن؛ ۲) بە هەڕە بڕینەوەی

دار؛ ۳) شانەکردنی مو؛ ۴) خوار کردنەوەی لك و دار؛ ۵) لە نوێ هێنان ف ۱) رام کردن؛ ۲) اره‌کردن؛ ۳) شانه زدن؛ ۴) خم نمودن؛ ۵) اختراع.
**داهێنانەوە:** خوارکردنەوە ف خم کردن.
**داهێنەر:** وەدی هێن ف مخترع.
**دای:** ۱) دایك، داڵك؛ ۲) کردەی ڕابوردوی دان: (**دای پێم**) ف ۱) مادر؛ ۲) فعل ماضی دادن برای سوم شخص مفرد.
**دایاخ:** سەبر، پشودان، حەوسەلە ف صبر.
**دایان:** ۱) تایەن، لەلەی ژن؛ ۲) کاری ڕابردەی دان بۆ کۆ ف ۱) ماما، دایه؛ ۲) فعل ماضی دادن برای سوم شخص جمع.
**دایانی:** تایەنی ف مامایی.
**دایرە:** ۱) دەفەی چکۆڵە؛ ۲) شوێنی کارگێڕی دەوڵەت ف ۱) دف کوچك؛ ۲) اداره.
**دایرە زەنگی:** دەفەی چوکی بەزریزە، گەواڵ ف دایره‌زنگی.
**دایسێ:** لە گڕدایە، هەڵبوە ف شعله‌ور است.
**دایك:** داڵك، نۆدا، دێ، جیا، داك ف مادر.
**دایکە:** ۱) وشەی دواندنی داڵك؛ ۲) مێوینەی لە سەر جوچکان؛ ۳) فەرمانی داکردن ف ۱) کلمهٔ خطاب به مادر؛ ۲) جفت مادهٔ پرنده؛ ۳) امر به ریختن.
**دایکەدزە:** دەسکیس ف شریك دزد.
**دایکەلێ:** وشەی دواندنی دایك بە خۆشەویستی ف کلمهٔ خطاب به مادر دوستانه.
**دایکەمار:** زەردە قۆڕە، جۆرێ مارمێلکە ف نوعی مارمولك.
**دایکەمارانە:** جۆرێ مارمیلکە ف نوعی مارمولك.
**دایکەوا:** ژنی بابەدەم ف حوّا همسر آدم.
**دایلاخ:** بەچکەوشتری یکساڵە ف شتر بچهٔ یکساله.
**دایلاغ:** دایلاخ ف شتر بچهٔ یکساله.
**دایلان:** ۱) سەیر، سەمەرە؛ ۲) دڵبەری زۆر جوان ف ۱) عجیب؛ ۲) دلربا و زیبا.
**دایم:** هەمیشە ف دائم.
**دایندە:** دڵاوا، دەهندە ف بخشنده.
**داینە:** ۱) داوێن، دامێن؛ ۲) فرمان بە دانان؛ ۳) بناری کێو ف ۱) دامن؛ ۲) امر به نهادن؛ ۳) دامنهٔ کوه.
**داینێ:** فرمان بە دانان ف بگذارش، امر به نهادن.
**دایە:** ۱) دایك؛ ۲) تایەن ف ۱) مادر؛ ۲) دایه.
**دایەخ:** بەهرە، فایدە ف بهره.
**دایەق:** دایەخ ف بهره.
**دایەڵکە:** ئامرازێکە لە ئاسیاودا ف ابزاری در آسیاب.
**دایەن:** تایەن، ئەوژنەی شیر ئەدا بە منالی خەڵك ف دایه، شیردهٔ به بچهٔ دیگران.
**داین:** دایەن ف دایەن.
**دایی:** دۆك، شۆکە ف سپیدك گیاهی.

**دبدب:** ۱) وشەیەکە شوان ئاژەڵی پێ بانگ دەکا؛ ۲) پاسەوان، ئێشك‌گر ف ۱) اصطلاحی برای خواندن گله؛ ۲) نگهبان.
**دبدۆب:** پاسەوان ف نگهبان.
**دبێ:** ئێژێ، دەڵێ ف می گوید.
**دبێدبێ:** دبدب، وشەی بانگ‌کردنی ئاژاڵ ف کلمهٔ خواندن گله.
**دپل:** تبل، قامك، تلی، ئەنگوست ف انگشت.
**دت:** دەدا: (**دت ئان نادت**: دەیدا یان نایدا) ف می‌دهد.
**دتەر:** لاسا، دەمەلاسکە ف تقلید، ادا.
**دج:** ۱) سوچ، قوژبنی دیوار؛ ۲) ددانە ف ۱) نبش دیوار؛ ۲) دندانه.
**ددا:** نەنە، نەنك، داپیرە ف مادربزرگ.
**ددان:** ئێسکی ناو دەم بۆ شت پێ خواردن، دان ف دندان.
**ددان ئاڵبونەوە:** دان ئاڵبونەوە ف نگا: دان ئاڵبونەوە.
**ددان تیژکردن:** تەماح کردن ف کنایه از طمع کردن.
**ددان چیرکردن:** ددان بەگڕی نیشاندان ف دندان قروچه.
**ددان خۆشك:** سپڵ ف طحال.
**دداندن:** ۱) شات و شوت کردن، خۆهەڵکێشان؛ ۲) درۆکردن ف ۱) لاف زدن؛ ۲) دروغ گفتن.
**ددان سپی بونەوە:** شەرم نەمان لە ڕوی گەورەتردا ف پررو شدن در برابر بزرگتر از خود.
**ددان گڕ:** ددان گەورە، ددان دەرپەڕیو ف دندان برجسته.
**ددانۆك:** کەلایی سەر دیوار و دەمە مشار ف دندانه.
**ددانە:** ددانۆك ف دندانه.
**ددو:** یەك و یەك، دو ف عدد دو.
**ددۆ:** ددو ف عدد دو.
**دڕ:** زبر، برێتی لە نەترسی بەدفەڕ: (سەگێکی دڕە، پیاوێکی دڕە) ف نترس و موذی.
**دراخە:** مەڵۆی دەخڵ ف یك‌دستهٔ کوچك از درویده.
**دراژە:** گوندێکی کوردستانە بەعسی وێرانی کرد ف نام روستایی که بعثیها ویران کردند.
**دراف:** ۱) پارە، دراو، پوڵ، پەرە؛ ۲) درزو قەڵشی دیوار؛ ۳) بالاف ف ۱) پول؛ ۲) درزو ترك دیوار؛ ۳) رخت شویی.
**دران:** ددان ف دندان.
**دڕان:** شڕو لەت بون ف دریده شدن.
**دڕاندن:** شڕکردن، لەت‌کردن ف دریدن.
**دڕانن:** دڕاندن ف دریدن.
**دراو:** دراف ف پول.
**دڕاو:** پارەبوگ، لەت‌کراو ف دریده.
**دراوسێ:** جیران، هاوسا ف همسایه.
**دراوسێ وەزن:** هاوسازەنجێن، خراپ دەگەڵ هاوسایان ف همسایه‌رنجان.
**دڕاوی:** جێگە دڕاو، شڕۆ لەتی ف دریدگی، پارگی.
**درباشە:** زەرگ، شیشی دەرویشان ف سیخ دراویش.

**ڕاكۆلين:** ڕاسان، بۆچون به توڕەیی ف نگا: ڕاسان.

**ڕاكه:** ١) غارده؛ ٢) بەرزكه ف ١) بدو؛ ٢) بلند كن.

**ڕاكـەتن:** ١) پاڵ‌كەفتن، ڕازان؛ ٢) چاوەنـوڕبونی دەرفەت ف ١) نگا: ڕازان؛ ٢) منتظر فرصت شدن.

**ڕاكەر:** ڕاست‌كەر، دەلاڵی نێوان كچ‌و كوڕ ف دلاّل محبت.

**ڕاكەش:** كێشەر، دل راكێش: (ژنك **ڕاكەش**و تەشقەلە كەرن) ف جاذبه، جذابيّت.

**ڕاكەوتن:** ڕاكەتن ف نگا: ڕاكەتن.

**ڕاكێش:** ١) كشان به سەر زەوی‌دا؛ ٢) ڕاكێش‌كەر، هۆی ڕاكیشان ف ١) كشش؛ ٢) كشنده.

**ڕاكێشـان:** ١) به سەر زەوی‌دا خزانـدن‌و بـردن؛ ٢) بەرەوخـۆ هێنان؛ ٣) لەدودان‌و درێژكردن: (گوریسـه كه **ڕاكێشـه**، لاقت **ڕاكێشـه**)؛ ۴) فڕانـدنی كچ به زۆری ف ١) بر زمين كشـاندن؛ ٢) بسوی خود كشيدن، جذب؛ ٣) دراز كردن؛ ۴) ربودن دختر مردم بەزور.

**ڕاگـر:** ١) بەرلێ‌گر، پێـش‌گر: (كـارەكەم **ڕاگرت** نەم هێشـت بكرێ)؛ ٢) ئاگاداری‌كەر: (ژنێكی ماڵ **ڕاگـره**)؛ ٣) چەتە، پیاوخراپ ف ١) مانع؛ ٢) نگاه دارنده؛ ٣) راهزن.

**ڕاگرتن:** ١) ئاگاداری لێ كردن؛ ٢) بەربەسـت كردن ف ١) نگهداری كردن؛ ٢) متوقف كردن.

**ڕاگڤاشتن:** گوشين بەدەست ف فشردن با دست.

**ڕاگـواسـتـن:** ١) گوێزانەوه، شتـێ له جێ‌یەكەوه بۆ جێ یەكی تر بردن؛ ٢) گوێزانەوه بەنهێنی ف ١) منتقل كردن؛ ٢) مخفيانه انتقال دادن.

**ڕاگوزار:** ١) ڕێباز، ڕێگەی هاتوچۆ؛ ٢) ڕێبوار، كەسێ بە ڕێگەدا دەڕوا ف ١) راه آمد و رفت، ممرّ؛ ٢) رونده، رهگذر، راهی.

**ڕاگوزەر:** ڕاگوزار ف نگا: ڕاگوزار.

**ڕاگوشين:** ڕاگڤاشتن ف فشردن با دست.

**ڕاگوێز:** جێ گۆركێ ف انتقال.

**ڕاگوێزان:** ڕاگواستن ف نگا: ڕاگواستن.

**ڕاگوێزتن:** ڕاگواستن ف نگا: ڕاگواستن.

**ڕاگه:** شوێنی هاتوچۆی خەڵك ف راه.

**ڕاگەش:** ١) حەنەكچی، قسەخۆش؛ ٢) نازكەر ف ١) شوخ و لو... ٢) نازكننده.

**ڕاگەهاندن:** ڕاگەیاندن ف ابلاغ كردن.

**ڕاگـەیانـدن:** ١) بەگوێ‌دادانی قسـەی مەبـەست؛ ٢) ڕاسپـاردن ف ١) تبليغ، ابلاغ، اعلام؛ ٢) سفارش.

**ڕاگـەیشتن:** ١) كورتی نەهێنـان، تێراكـردن: (دەستم پێ **ڕاگەیشت**، دارەكە بە خانو **ڕاناگا**، نانەكە بە هەموان **ڕاگەیشت**)؛ ٢) سەرپرشتی كردن ف ١) كوتاه نياوردن، رسيدن؛ ٢) سرپرستی كردن.

**ڕاگەيين:** گەیشتنی ڕاسپێری ف رسيدن پيام و تبليغ.

**ڕاگەیێن:** كەسێ كه سپاردەی قسه دەگەیێنێ ف پيام‌رسان.

**ڕاگير:** ڕێگر ف رهزن.

**ڕاگيران:** ١) وەستـــان، پێش‌گيران؛ ٢) ئاوه دزكـــردنی برین: (دەستم ڕاگيراوه) ف ١) ايستادن، متوقف شدن؛ ٢) عفونت زخم و دمل.

**ڕاگيربون:** وەستان ف بندآمدگی.

**ڕاگيركردن:** وەستاندن ف بند كردن، متوقف كردن.

**ڕاگيرنامه:** پسولەی بردنە زیندان ف سند دستگيری.

**ڕام:** ١) بـڕوای من؛ ٢) كـەوی، فێـر، خوگـرتـــو ف ١) رأی من؛ ٢) خوگرفته، رام.

**ڕاماڵ:** ڕاستەو ڕاست بەرخۆدان‌و ماشتن: (چێشتەكەی **ڕاماڵی** هەموی خوارد، ئەم زبڵ‌و زاڵە **ڕاماڵه**) ف جلو دادن و بادست رد كردن، جلو انداختن و روبيدن.

**ڕاماڵان:** ڕاماڵ ف نگا: ڕاماڵ.

**ڕاماڵدان:** ڕاڕفاندن به هێزی دەست ف رفت‌وروب كردن.

**ڕاماڵين:** ڕاماڵ ف نگا: ڕاماڵ.

**ڕامـان:** ١) دەبیرەوه چـوٗن، مات‌بوٗن‌و بیر كردنەوه؛ ٢) سەرسوڕمـان ف ١) در فكر فرورفتن؛ ٢) متحيّر ماندن.

**ڕامـاو:** ١) دەبیرەوه چوٗگ؛ ٢) سەرگەردان ف ١) در فكـر فرو رفتـــه؛ ٢) سرگردان.

**ڕامای:** ڕاماو ف نگا: ڕاماو.

**ڕام‌بوٗ:** كەوی‌كراو، له سڵی داتەكاو ف رام شده.

**ڕام‌بوٗگ:** ڕام‌بو ف رام شده.

**ڕام‌بوٗن:** كەوی بوٗن، له سڵی دەست هەڵگرتن ف رام شدن.

**ڕامكـه:** ١) ئەو هێلكەی دەبن مریشكـی هیلكەكەری دەنێـن، ڕاوكه؛ ٢) ڕامی بكـه ف ١) تخمی كه زير مرغ گذارند تا تخم بگذارد؛ ٢) رامش كن.

**ڕامل:** پەك‌كەوتن له وەرام دانەوه، دامان له جواب ف درماندن از جواب.

**ڕامـــل خستن:** قســـه پێ نەهێشتن، پەك‌خستنی هاودوێن له وەرام ف اتمام‌حجت، الزام دادن، محكوم كردن در بحث.

**ڕاموٗز:** ماچ، پاچ ف بوسه.

**ڕاموٗس:** ڕاموٗز ف بوسه.

**ڕاموٗسان:** ١) ڕاموٗز؛ ٢) ماچ‌كردن ف ١) بوسه؛ ٢) بوسيدن.

**ڕاموٗسين:** ماچ‌كردن، پاچ كردن ف بوسيدن.

**ڕامه:** ڕامكه، ڕاوكەی مریشك ف تخمی كه زير مرغ تخمگذار می‌نه[ند].

**ڕامیـــار:** ١) شـوانـی پەز؛ ٢) ڕەوكـەوان، ئاگـاداری ڕەوەی ئەسـپ؛ ٣) سیاسـەت‌زان ف ١) چوپـان گله؛ ٢) نگـهبـان رمـه اسـب؛ ٣) سياستمدار.

**ڕامیـاری:** ١) شوانـی؛ ٢) ڕەوكەوانی؛ ٣) سیـاسەت ف ١) چوپانی؛ ٢) نگهبانی رمه اسب؛ ٣) سياست.

**ڕامیس:** ماچ، ڕاموٗز، ڕاموسان ف بوسه.

**ڕان:** ١) له ئەژنۆ بەرەژوٗر تا سمت؛ ٢) مێگەلە مەڕ؛ ٣) گاگەل ف ١) ران؛ ٢) گلهٔ گوسفند؛ ٣) رمهٔ گاو.

**ڕانان:** ١) بەرچاوی حەشامات دان؛ ٢) له سەر سنگ ئاوخواردنەوه، دەم دەكانی ژەندن؛ ٣) شوێن كەوتن بۆ گرتن ف ١) بەنمايش گذاشتن؛ ٢) دَمَر آب از چشمه خوردن؛ ٣) دنبال كردن، تعقيب.

**ڕاناو:** ١) نیشانی خەڵك دراو؛ ٢) پیتێ کە هێمایە بۆ ناوێك ف ١) بەنمایش گذاشتە شدە؛ ٢) ضمیر دستوری.

**ڕانبار:** ئاژۆ، لێخوڕ، کەسێ کە بارەبەر ئەڕانێ ف راننده.

**ڕاندن:** ١) ئاژۆتن، لێخوڕین؛ ٢) هاویشتن ف ١) راندن، راەانداختن؛ ٢) سنگ پرانی.

**ڕانك:** شەرواڵی لە بوزو، شاپك، پاتۆڵی بوزو ف شلوار از شال، شلوار پشمی محلی.

**ڕانکە:** تیسکی دەوری گوانی ئاژەڵ کە برینگی ناکەن لە ترسی دڕك تێ چەقین ف پشم اطراف پستان بز و گوسفند کە برای محفوظ ماندن پستان از خار چیده نمی‌شود.

**ڕانما:** شارەزا، بەڵەد ف راهنما.

**ڕانمونی:** شارەزایی کردن ف رهنمونی.

**ڕانوان:** ڕانان ف بەنمایش گذاشتن.

**ڕانواندن:** ڕانان ف بەنمایش گذاشتن.

**ڕانە:** ڕانك ف شلوار شال.

**ڕانەرم:** خۆش چێژەو نەرم و نیان ف خوش مزە نرم.

**ڕانی:** ١) ڕانك؛ ٢) لێی خوڕی، ئاژۆتی ف ١) شلوار شال؛ ٢) راه انداخت.

**ڕانین:** ئاژۆتن، لێ‌خوڕین ف رانندگی.

**ڕانیە:** شارێکە لە کوردستان ف نام شهری در کردستان.

**ڕاو:** ١) ڕاڤ؛ ٢) گزی و فێڵ ف ١) شکار؛ ٢) نارو، کلك.

**ڕاوار:** یەکسمی خۆشڕۆ ف رهوار.

**ڕاوان:** وڕێنە، قسەی نەخۆشی بێ هۆش ف هذیان.

**ڕاواندن:** وڕێنە کردن ف هذیان گفتن.

**ڕاوبان:** ڕێگەی هاتوچۆی هەموان ف راهها، شارع عام.

**ڕاوچی:** ڕاڤەڤان ف شکارچی.

**ڕاوڕ:** جانەوەری کێوی، درندە ف جانور وحشی.

**ڕاوراندن:** دەرباز بوون، ڕزگار بوون ف رستگار شدن.

**ڕاورتن:** لێك بڵاو بوون، هەریەك بەلایەکا چوون ف پراکندە شدن.

**ڕاوشکار:** ڕاو بە دەستی جەم ف شکار گروهی.

**ڕاوك:** ڕاڤەك، پاڵوێنەی شیر و شتی تراو ف پالونە.

**ڕاوکە:** ڕامکە ف نگا: ڕامکە.

**ڕاوکەر:** ڕاڤەڤان ف شکارچی.

**ڕاوگە:** جێ ڕاو ف شکارگاه.

**ڕاونان:** شوین کەوتن بۆ گرتن، دانەدو، دانەپەی ف دنبال کردن، تعقیب بە قصد گرفتن.

**ڕاونیان:** ڕاونان ف نگا: ڕاونان.

**ڕاووڕو:** زمان‌لوسی، کلکەسوتە، مەرایی ف تملّق و چاپلوسی.

**ڕاووڕووت:** ڕێگری و دزی ف راهزنی و مردم لخت کردن.

**ڕاووڕیس:** بەنی تەون ف ریس بافندگی.

**ڕاووڕیو:** فێڵ و فەرەج، دزی و فزی ف دوزوکلك.

**ڕاووشکار:** ڕاوشکار ف شکار گروهی.

**ڕاوە:** ١) شی کردنەوەی واتا؛ ٢) بوێسە، فەرمانە بە وێستان ف ١) شرح و تفسیر؛ ٢) امر بە ایستادن.

**ڕاوەدونان:** دانەپەی، ڕاونان ف دنبال کردن.

**ڕاوەڕێوی:** ١) گەڕان بۆ ڕێوی گرتن؛ ٢) بریتی لە فێڵ و گزی دەکارهێنان ف ١) شکار روباه؛ ٢) کنایە از کلك‌زدن.

**ڕاوەستان:** ١) بە پاوە وێستان؛ ٢) نەجوڵان، نەبزوتن؛ ٣) بریتی لە بێ‌کاربون ف ١) سرپا ایستادن؛ ٢) حرکت نکردن؛ ٣) کنایە از بیکار شدن.

**ڕاوەستاندن** ١) لە بزوتن گێڕانەوە؛ ٢) بەقیتەوە بڵندکردن ف ١) از حرکت بازداشتن؛ ٢) بلند نگەداشتن.

**ڕاوەستاو:** ١) چەق، بێ بزوتن؛ ٢) بەپێوە؛ ٣) بریتی لە دەسەڵاتداری و هەرمان: (خوا **ڕاوەستاوت** کا، هەر **ڕاوەستاو** بی) ف ١) ثابت، راکد؛ ٢) برپا ایستادە؛ ٣) پایدار.

**ڕاوەستۆخ:** هەمیشە نیشتەجێ، کەسێ کە لە شوێنێك لا ناکەوی ف ثابت، مقیم همیشگی.

**ڕاوەش:** بزوتنەوەی توند، تەکان ف تکان شدید.

**ڕاوەشان:** ڕاوەش ف تکان شدید.

**ڕاوەشاندن:** ڕاتەکاندن ف تکان شدید دادن.

**ڕاوەشاو:** تەکاو ف تکان دادە.

**ڕاوەشێن:** تەکێنەر ف تکاننده.

**ڕاوەشین:** ڕاوەشان ف تکان شدید.

**ڕاوەك:** ڕاوك ف پالونە.

**ڕاوەکانی:** ڕاوی کەو بە تۆڕ ف شکار کبك با تور.

**ڕاوی:** ١) تاژی یان مەلی فێرەڕاو؛ ٢) وتار گێڕەوە ف ١) سگ یا پرندۀ شکاری؛ ٢) راوی.

**ڕاویار:** ١) ڕێبوار، کەسێ بەڕێگەدا بۆ سەفەر دەڕوا؛ ٢) ڕاوکەر ف ١) رهگذر، مسافر؛ ٢) شکارچی.

**ڕاوێچکە:** ١) بیرکردنەوە لە شتێ، ڕامان؛ ٢) هات و چۆکردن لە یەك شوێن لەبەر بێ‌کاری: (ئازیەکە **ڕاوێچکە** دەکا) ف ١) تفکّر در چیزی کردن؛ ٢) آمدورفت در یکجا از بیکاری.

**ڕاوێژ:** ١) بەخەیاڵ بۆچون: (بە **ڕاوێژ** دەبێ کەروێشك لەم ئاقارانە بێ)؛ ٢) تەگبیر و ڕا؛ ٣) دەراوی دەم: (**ڕاوێژی** خۆشە کە قسە دەکا) ف ١) حدس؛ ٢) تدبیر، مشورت؛ ٣) طرز ادای کلمات.

**ڕاوێژکردن:** تەگبیر کردن، لێ کۆڵینەوە، لێ‌دوان ف مشورت کردن.

**ڕاوێژکە:** ڕاوێچکە ف نگا: ڕاوێچکە.

**ڕاوێژکەر:** بەتەگبیر، تەگبیرکەر ف رایزن، مستشار.

**ڕاوێژگا:** جێگەی تەگبیر لێ کردنەوە ف دارالشّورا.

**ڕاوێژگە:** ڕاوێژگا ف دارالشّورا.

**ڕاوێژەر:** ڕاوێژکەر ف رایزن.

**ڕاوێژیار:** ڕاوێژکەر ف رایزن.

**ڕاوێستان:** ڕاوەستان ف نگا: ڕاوەستان.

**ڕاوێستاندن:** ڕاوەستاندن ف نگا: ڕاوەستاندن.

**ڕاوێستاو:** ڕاوەستاو ف نگا: ڕاوەستاو.

**ڕاوێشکە:** ڕاوێچکە ف نگا: ڕاوێچکە.

**ڕاە:** ڕاگە ف راە.

**ڕاهـاتن:** فێر بـوُن بەباشی، هەڤوتن: (متالاّی حاشیەی زولفت لە سەر سەفحـەی ڕوخت سەعبە / بەوەم چا بو بەمندالّی لە دەرسی عیشق **ڕاهــاتم**) «حــەریق» ف تعلیم دیدن، مشق کردن، تمــرین کردن، یادگرفتن، عادت کردن.

**ڕاهاتو:** فێرکراو، فیرەکارکراو ف تعلیم دیدە.

**ڕاهاتی:** ڕاهاتو ف تعلیم دیدە.

**ڕاهشتن:** پەلاماربردن: (**ڕاهشتە** من م باز دا) ف حملە کردن.

**ڕاهن:** ١) ڕان، لە زرانی بەرەژوُر تا زگ؛ ٢) گونــد یکی کوردستـانـە بەعسی وێرانی کرد ف ١) ران؛ ٢) نام روستایی در کردستان کە بعثیها ویران کردند.

**ڕاهوەند:** بنکی ڕێواس، ڕەگی کلاّوبن ف ریوند.

**ڕاهــی:** ١) ڕزگار؛ ٢) هەلّهاتنــی شتی دژوارو چەتون ف ١) نجـات؛ ٢) حلّ مشکل.

**ڕاهیژاندن:** لە پڕو نەکاو بە سەردا دان ف ناگهانی حملە بردن.

**ڕاهێشتن:** ١) ڕاداشتن؛ ٢) ڕاتەنگاوتن؛ ٣) بریتی لە با لە زگ دەرکردن؛ ٤) پەلاماردان، شالاّوبردن؛ ٥) داوی بە قولاپەوە فڕێ دانەناو ئاو بۆ ماسی گرتن ف ١) نگا: ڕاداشتن؛ ٢) نگا: ڕاتەنگاوتن؛ ٣) کنایە از باد شکم خالی کردن؛ ٤) حملە کردن؛ ٥) پرتـاب قلاب بە داخـل آب برای ماهیگیری.

**ڕاهێل:** ئەو تالاّنەی لە تەوندا پۆیان تێوە دەدری ف تار بافندگی.

**ڕاهێلاّن:** ١) ڕاهێشتن؛ ٢) ڕاتەنگاوتن ف ١) نگا: ڕاهێشتن؛ ٢) نگا: راتەنگاوتن.

**ڕاهێل‌بون:** ١) ڕێزبونی داوی تەون یان بوزو بۆ ئامادەبونی پۆ تێوەدان؛ ٢) بریتی لە هەلّەنگوتن و ڕەت‌بردن و کەوتن ف ١) ردیف شدن تارها در بافندگی؛ ٢) کنایە از سکندری خوردن و بر سر افتادن.

**ڕاهێل کردن:** ڕێزکردنی داوی تەون یان بوزو ف ردیف کردن تارهای بافتنی.

**ڕاهێن:** کەسێ کە مرۆ یان گیانداری تر تالیم دەدا، فێرکەر ف آموزندە، مربّی، معلّم.

**ڕاهێنـان:** ١) فێرکـردن لە کـاردا؛ ٢) کەوی کردن، حەمایەت کـردن ف ١) تعلیم دادن؛ ٢) رام کردن.

**ڕای:** ١) ئەڕای، بۆچە، لەبەرچی؛ ٢) لەبەر ف ١) چرا؛ ٢) برای.

**ڕایاخ:** ڕاخەر ف زیرانداز.

**ڕایج:** ١) ئەو پارەی کە وەردە گیرێ؛ ٢) مالّێ کە کڕیاری زۆرە ف ١) پول رایج مملکت؛ ٢) کالای پررونق.

**ڕایخ:** ڕایاخ، ڕاخەر ف زیرانداز.

**ڕایدان:** شان‌دان، نیشاندان ف نشان دادن.

**ڕایش:** لەبەر نویسراو ف نسخە برداشتە، رونوشت.

**ڕایشان:** لەبەر نوُسینەوە ف نسخەبرداری.

**ڕای‌مەزن:** ١) لەخۆبایی؛ ٢) خۆ لە خەلّك بە زیاتر زان ف ١) متکبر؛ ٢) خود را برتر از دیگران دانستن.

**ڕایە:** شیاوی، حەد: (**ڕایەم** ناکەوێ باست بکەم) ف شایستگی.

**ڕایەت:** مسکێن، ڕەعیەت، کاسبکاری بەردەستی ئاغا ف رعیّت.

**ڕایەکەوتن:** شیاوی، ڕایە ف شایستگی، لیاقت داشتن.

**ڕایەل:** ڕاهێل هەوالّی پۆ ف تارهای بافت، مقابل پود.

**ڕایەلکە:** ڕاوێچکە، هاتوچۆ، لە تەنیا شوێنێکدا هاتوچۆکردن ف قدم زدن در یکجای معیّن.

**ڕایـەلـە:** ١) ڕاهێل؛ ٢) ڕاوێچکـە بەهـەمو ماناوە ف ١) نگا: ڕاهێـل؛ ٢) نگا: ڕاوێچکە.

**ڕایی:** ڕاهی ف نگا: ڕاهی.

**ڕاییل:** ڕاهێل ف تار بافتنی.

**ڕب:** ١) چارەگ، پاژێ لە چوارپاژ؛ ٢) میوەی کولێندراو، مرەبا: (**ڕبی** تەماتە، ڕبەنار) ف ١) یك‌چهارم، چارك؛ ٢) رب چاشنی.

**ڕبات:** بەستراو، دژی ئازاد ف بستە شدە، مقابل آزاد.

**ڕبـازە:** ١) ڕەپستـە؛ ٢) ئامادە کردنی زەوی بە ئاودان بۆکێلاّن ف نگا: ڕەپستە؛ ٢) آبیاری زمین برای کاشتن.

**ڕبـاس:** دێرانی زەوی بەر لە چاندن، ئاوداشتن بۆ ڕەپستە، ئاویاری بۆ ئاوەنیا، کەشاو ف آبیاری زمین قبل از شخم زدن و کاشتن.

**ڕبـاسە:** ١) ڕباس؛ ٢) کەشاو ف ١) نگا: رباس؛ ٢) نیم خشك شدن زمین بەطوری کە قابل کشت باشد.

**ڕبس:** زەوینی ئاویاری کریاو بەر لە کێلاّن و چاندن ف آبیاری شدە قبل از شخم.

**ڕبسان:** ئاوداشتەی ئامادە بۆ کێلاّن، کەش ـتنەوە ف آبیاری شدۀ آمادۀ شخم.

**ڕبە:** جۆرێ پێوانەیە بۆ دەخلّ ئەندازەی نزیك دوکیلۆیە ف نوعی پیمانۀ غلّە.

**ڕبێز:** ڕێواس ف ریواس.

**ڕبێس:** ڕبێز ف ریواس

**ڕپان:** ڕوان، سەوزبونی گیا ف روییدن، رستن.

ڕپاندن: ڕواندن، شین کردن ف رویانیدن.

**ڕپتۆك:** دۆشاوی یەکجار کولێندراو ف شیرۀ یکبار جوشیدە.

**ڕپلاندن:** دەورەی دار هەلّ پەرتاوتن بۆ بەرزبونەوەی تاقە دارێك ف قطع شاخەهای اضافی درخت برای رشد شاخۀ اصلی، هرس.

**ڕپن:** پنج، پنجی گیا ف ریشە، بُن.

**ڕپن داقوتان:** پنج بەزەویاکوتان ف ریشە دوا ـ ـ

**ڕپن‌داکوتان:** پنج‌داکوتان ف ریشە دوانیدن.

**ڕپن‌دان:** ڕپن داکوتان ف ریشە دوانیدن.

**ڕپنی:** بارانەی پەلّە ف باران کافی برای مزروعات.

**ڕپنین:** پەلّە دان ف آمدن باران کافی.

**ڕپە:** دەنگی تەپەی پا یان بەدارکوتان ف صدای پا یا کتك‌کاری.

**ڕت:** ١) قسەی بێزاری، نفرە؛ ٢) دەرکردنی ناخۆشەویست؛ ٣) بڕوات

ف ۱) نفرین؛ ۲) دك؛ ۳) برود.
**ڕتاخ:** سێف زەمینە، یارەڵماسی ف سیب‌زمینی.
**ڕتام:** ڕەملی ورد، قوم ف ریگ.
**ڕتان:** ۱) نفرەگوتن؛ ۲) وەدەرنران ف ۱) نفرین گفتن؛ ۲) دك شدن.
**ڕتاندن:** ۱) جوێن پێدان؛ ۲) وەدەرنانی ناخۆشەویست ف ۱) نفرین کردن؛ ۲) دك کردن.
**ڕتل:** گون، گونك، باتو ف خایە.
**ڕتلۆ:** گون هەڵمساو، باتو باکردو ف خایە آماسیدە.
**ڕتم:** بەرگر، لەمپەر ف سدّ، بندآور.
**ڕتمی:** بەرگیراو ف مسدود.
**ڕتۆ:** ڕۆیشتن، ڕەوت ف رفتار.
**ڕتۆپی:** ڕێوی، ڕواس، چتر ف روباە.
**ڕجڕج:** پەڵەی شین لە پێست لە کەوتن‌و لێدانەوە ف لکهٔ کبود بر پوست در اثر ضرب‌دیدگی.
**ڕجڕجان:** شین‌بونەوەی پێست لە وێکەوتنەوە ف کبود شدن پوست از ضربت.
**ڕجڕجیان:** ڕجڕجان ف نگا: ڕجڕجان.
**ڕجڕجین:** ڕجڕجان ف نگا: ڕجڕجان.
**ڕجوا:** ڕەوا، دڵ بەرایی دان ف روا، روادانستن.
**ڕجوادیتن:** ڕەوادیتن، دڵ پێ‌ڕازی بون ف روادیدن.
**ڕجوادین:** ڕجوادیتن ف روادیدن.
**ڕجە:** ۱) تەنافی جلکان؛ ۲) بەنی شاقوڵی بەننا ف ۱) طناب لباس خیس؛ ۲) نخ راستهٔ بنایی.
**ڕچ:** ۱) بەستەڵەك، زەوینی وشك هەڵاتو لە سەرمان؛ ۲) مەین، توندبونی شیر و هەر شتی شل‌و تراو؛ ۳) ددانی لێو لەسەر هەڵماڵدراو ف ۱) یخبندان؛ ۲) انعقاد مایعات؛ ۳) دندانها بەحالت قروچە.
**ڕچان:** ۱) بەستنی سەهۆڵ؛ ۲) مەیین ف ۱) یخ بستن؛ ۲) منعقد شدن.
**ڕچاندن:** ۱) مەیاندن؛ ۲) کردنەسەهۆڵ ف ۱) منعقد کردن؛ ۲) یخ زدە کردن، یخ بستن.
**ڕچاو:** ۱) بەستو؛ ۲) مەیو ف ۱) یخ بستە؛ ۲) منعقد شدە.
**ڕچە:** کوێرەڕێ، ڕێگەی زۆر باریك، بزنەڕێ ف کورەراە، مالرو.
**ڕچەشکاندن:** بەفر بەپاکوتان بۆ ڕێگە کردنەوە ف راە در برف کوفتن با پای.
**ڕچەقوتان:** ڕچەشکاندن ف نگا: ڕچەشکاندن.
**ڕچە کردنەوە:** ڕچەشکاندن ف نگا: ڕچەشکاندن.
**ڕچە کوتان:** ڕچەشکاندن ف نگا: ڕچەشکاندن.
**ڕچە کوتانن:** ڕچەشکاندن ف نگا: ڕچەشکاندن.
**ڕچیان:** ڕچان ف نگا: ڕچان.
**ڕچیو:** ڕچاو ف نگا: ڕچاو.
**ڕح:** گیانی جانەوەر، ڕوح ف جان.
**ڕحان:** ۱) گیانان؛ ۲) ڕیحان ف ۱) جانها؛ ۲) گیاە ریحان.
**ڕداڵ:** تەڕپیر، پیری چاوحیز ف پیر هوسباز.
**ڕدمایات:** گوندێکی کوردستانە بەعسی وێرانی کرد ف نام روستایی در کردستان کە بعثیها ویران کردند.
**ڕدۆز:** ئامانەتی بەسەریەکدا دروانی جلك کە جلدرو دەیکەن ف پرو خیاطی.
**ڕدین:** ئەڕدێن، موی سەر چەن، ڕیش ف موی زنخ، ریش.
**ڕدێن:** ڕدین ف نگا: ڕدین.
**ڕز:** ۱) زنجیری باریك؛ ۲) لەبەریەك چویی لە زۆرمانەوەدا ف ۱) زنجیر نازك؛ ۲) پوسیدگی.
**ڕزان:** لەبەریەك چون‌و خرابون لە زۆرمانەوە یان لە تەڕایی، پەڕتین ف پوسیدن.
**ڕزاندن:** پەڕتاندن ف پوسانیدن.
**ڕزانن:** ڕزاندن ف پوسانیدن.
**ڕزاو:** داڕزاو، بەکارنەماو لەبەر ڕزین ف پوسیدە، لهیدە.
**ڕزد:** زنجیرەکێو، چەند چیایەك بەپاڵ یەکەوە ف سلسلەجبال.
**ڕزدە:** ۱) ئاڵقەڕێزی درگا؛ ۲) زنجیرەکێو ف ۱) حلقە و زنجیر در؛ ۲) سلسلەجبال.
**ڕزدی:** زنجیرەکێو ف سلسلەجبال.
**ڕزق:** جانەوەرێکە لە بەینی سمۆرەو مشکا، بان‌بانك ف جانوری از سمور کوچکتر.
**ڕزك:** پژان، تایبەتی پژانی خوێن ف خونریزی.
**ڕزکیان:** لوت‌پژان ف خون‌دماغ.
**ڕزگ:** ۱) ڕیز، سەف، چەند شت بەپاڵ یەکەوە؛ ۲) هەراش، زل‌تر لە هاوزایان ف ۱) ردیف؛ ۲) بالندەتر از همزادان.
**ڕزگار:** ئازاد، ئازا ف رستگار، آزاد و رها.
**ڕزگاری:** ئازادی ف رستگاری.
**ڕزگە دوێنی:** گوندێکی کوردستانە بەعسی وێرانی کرد ف نام روستایی در کردستان کە بعثیها ویران کردند.
**ڕزم:** قەومانی لەنکاو ف پیشامد نامنتظرە.
**ڕزن:** ڕیزە، چینە ف ردە، چین دیوار مثلاً.
**ڕزندی:** لولە ف لولە.
**ڕزۆك:** ۱) میوەی کرمۆڵی ڕزیو؛ ۲) شیاوی ڕزین ف ۱) میوهٔ کرم‌زدهٔ لهیدە؛ ۲) آمادهٔ پوسیدن.
**ڕزەك:** ڕزۆك ف نگا: ڕزۆك.
**ڕزەڵ:** ڕزیوی بەکارنەهاتو ف لهیدهٔ از کار افتادە.
**ڕزەڵۆك:** ڕزەڵ ف لهیدهٔ از کار افتادە.
**ڕزی:** داڕزاو ف پوسیدە، لهیدە.
**ڕزیاگ:** ڕزی ف پوسیدە، لهیدە.
**ڕزیان:** ڕزان ف پوسیدە.
**ڕزیانك:** ڕازیانە ف رازیانە.
**ڕزیلە:** نەخۆشی بێ‌هێزی پەك‌کەوتە ف بیمار لاغر از کار افتادە.
**ڕزین:** ڕزان ف پوسیدن.
**ڕزیو:** ڕزاو ف پوسیدە.

**ڕزیوه:** ڕزیله ف نگا: ڕزیله.
**ڕژان:** لەسەرەوە بۆ ژێرەوە کەوتنی ئاو یان هەرشتی تراو یان دەنکی زۆر ف فروریزی، ریزش.
**ڕژانـدن:** بەرەوخـوار کردنەوەو بەرەلاکردنی دەنك یان ئاو یان هەرشتی تراو ف فروریختن مایع و دانه.
**ڕژانن:** ڕژاندن ف نگا: ڕژاندن.
**ڕژانەیەك:** تێکەڵاوبوونو مل دەبەر ملی یەکتر نان ف درهم آمیختن، گلاویزشدن.
**ڕژاو:** پرژاوی دەنكو ئاو یان هەرشتی تراو ف پاشیده، فروریخته.
**ڕژتن:** ڕژاندن ف فروریزاندن مایع و دانه.
**ڕژد:** ۱) هەورازی کـوڕ، هەورازێ که به دژواری لێـی سەردەکـەون؛ ۲) چـرووك، دەس قوچـاو، سەقیـل؛ ۳) دەبـــالاکـردن، زل‌بون ف ۱) سربالایی سخت؛ ۲) خسیس؛ ۳) رشد.
**ڕژد کردن:** گەورەبون، بالاکردن ف نموّ، رشد.
**ڕژدی:** بەتـونـدی هاتنی ئاو: (ئاوی چێم گەلەکی ڕژدە)؛ ۲) سەقیلی، چرووکی، چکووسی، چکوودی ف ۱) فشار جریان آب؛ ۲) بخل، خسّت.
**ڕژکی:** جۆرێ هەنجیرە کێویلە ف نوعی انجیر وحشی.
**ڕژە:** کرێژی سەر ف سبوسه، شورهٔ سر.
**ڕژەدار:** سەربەکرێژ، قرێژبەسەر ف سر با شوره.
**ڕژی:** ۱) خەڵـــوز، ڕەژوو، ڕەژی، کومـــر؛ ۲) چێشتی بێ چەورایی؛ ۳) خلتـەی جگەرەو سەبیلە؛ ۴) سووتاو بە بن بەرۆشەوە ف ۱) زغال؛ ۲) آش بدون چربی؛ ۳) نیکوتین سیگار؛ ۴) سوختهٔ ته دیگ.
**ڕژیاگ:** ڕژاو ف ریخته.
**ڕژیان:** ڕژان ف ریختن.
**ڕژیانـەمـل:** بە چەنـد کەس لەکەسێ‌دان ف چند نفری بر سر کسی ریختن و زدن.
**ڕژیانەیەك:** ڕژانەیەك، تێك چرژان ف درهم آمیختن، گلاویز شدن.
**ڕس:** ۱) مەیـن، تونـدبـوونی تـراو، ڕج؛ ۲) پەتی باریکـی هۆنراو ف ۱) لخته‌شدن، منعقد شدن؛ ۲) رشته.
**ڕست:** ۱) ڕس، پەتی باریکی هۆنـراو؛ ۲) قەلادەی ملەتاژی؛ ۳) داب و عادەت ف ۱) رشته؛ ۲) قلادهٔ گردن؛ ۳) روش، سنّت، عادت.
**ڕستك:** ۱) ڕست؛ ۲) ملوانکە ف ۱) نگا: ڕست؛ ۲) گردنبند.
**ڕستـن:** ۱) بادانـی بەنو لۆکە بە تەشـی؛ ۲) برێتـی لە چەنەبازی ف ۱) ریسیدن؛ ۲) کنایه از پرگویی.
**ڕستـە:** ۱) پەتی باریکی ملی تاژیو...؛ ۲) چەنـد وشـە کە مانـا تەواو دەکـەن، جومـلە؛ ۳) هەڕشتـــە، هەویری بەهـــاروی باریك‌بڕاوی وشکـــەوەکـراو بۆ چێشت ف ۱) رشتـهٔ گردن حیوانـات؛ ۲) جملهٔ دستوری؛ ۳) رشتهٔ خوراکی.
**ڕستی:** بنچینەی خانو، هیم، بناخە ف شالودهٔ بنا.
**ڕسق:** ۱) بژیوێ کە خوا دەیدا؛ ۲) ڕیچاڵ، هەرچی لە شیر پەیدا دەبێ؛ ۳) ڕزق، بان‌بانـك ف ۱) روزی؛ ۲) فراوردهٔ شیر؛ ۳) جانـوری از سمور کوچکتر.
**ڕسـك:** ۱) ڕست؛ ۲) خوێنی لووت پژان ف ۱) نگا: رست؛ ۲) خون از دماغ آمدن.
**ڕسکان:** ۱) دروستبونی سرشتی؛ ۲) جۆش خواردنی پەیوەندی دار؛ ۳) ڕوانو هەڵچـون: (دارێك لەو ناوە ڕسکاوە) ف ۱) بەوجود آمدن طبعی؛ ۲) جوش خوردن پیوند درخت؛ ۳) رویيدن و رشد کردن.
**ڕسکاندن:** خوێنی کەپ پژاندن ف خون از دماغ آوردن.
**ڕسکاو:** ۱) دروست بوی سرشت؛ ۲) پەیوەندی خۆگرتو ف ۱) مخلوق طبیعی؛ ۲) پیوند جوش خورده.
**ڕسکی:** لکا، پێوە نووسا ف چسبید.
**ڕسکیان:** خوێن پژانی لوت ف خونریزی بینی.
**ڕسکین:** خوێنی دم بەربون ف خون دماغ شدن.
**ڕسکێن:** جۆرێ گەمــە بە وردەبـەرد وەك دامـە کردن: (سێ‌ڕسکێن، نۆڕسکێن) ف نوعی بازی با شن، دوزبازی.
**ڕسل:** دۆلاب لە دیواردا ف کمد در دیوار.
**ڕسوا:** تابڕونەماو، ناوزڕاو، ڕوسیا ف رسوا.
**ڕسەر:** مەڕی سەروملسور ف گوسفند سر و گردن سرخ.
**ڕسـیـان:** ۱) ڕچیـان، مەییـن؛ ۲) هەڵـــدێـران، پەرت‌بون لـەژوروڕا؛ ۳) گەیشتن، پێ‌گەیشتن بۆ میوەو دەغل ف ۱) منعقد شدن مایع؛ ۲) پرت شدن از بالا، سقوط؛ ۳) رسیدن میوه و غلّه.
**ڕسین:** ۱) پژانی خوێنی بێڤل؛ ۲) بە پەنا یەکترەوە نووساندن ف ۱) خون دماغ؛ ۲) به هم چسبانیدن.
**ڕشاندن:** پرژاندن ف پاشیدن.
**ڕشـــانـەوە:** ۱) وەڕشـان، هێنـانـەوە؛ ۲) سیس‌بونو گوڵوەرینی دار بێ‌وەخت ف ۱) قی، بالا آوردن؛ ۲) پژمردن و شکوفه‌ریزی بی‌موقع درخت.
**ڕشت:** شت بەشت وەگۆڕین ف معاملهٔ پاياپای، معاوضه.
**ڕشتن:** ۱) ڕژاندن؛ ۲) کل دەچاوکێشان؛ ۳) نەخشان: (کەو خاڵو میلی ڕشتون) ف ۱) ریختن؛ ۲) سرمه به چشم کشیدن؛ ۳) نقش و نگار.
**ڕشتنەوە:** برێتی لە ئاژاوە نانەوەو خەڵك بە گژیەکاکردن ف کنایه از فتنه‌انگیزی.
**ڕشتە:** هەرشتەی گەنمەبەهارو ف رشتهٔ خوراکی.
**ڕشدە:** ڕشتە ف رشتهٔ خوراکی.
**ڕشفەت:** پوولێ کاربەدەست بۆ ڕێك خستنی کارێك بەنارەوا دەیسێنێ ف رشوه.
**ڕشك:** گەرای ئەسپێ ف تخم شپش.
**ڕشکاوی:** کەسێ لە چلکنیان ڕشكو سپێی پێوەیە ف شپشو.
**ڕشکن:** ڕشکاوی ف شپشو.
**ڕشکۆ:** ڕشکاوی ف شپشو.
**ڕشێنە:** وردەبارانی هێدیو نەرم ف نم‌نم ریز و کم‌باران.
**ڕف:** ۱) تاقـەی زۆپی لە دیوار بۆ شـت لەســەر دانـان، ڕفـە، ڕفحـە؛ ۲) بنەمای وشەی ڕفاندن، فڕاندن، پڕپێداکردنو بردن ف ۱) رف؛ ۲)

ڕبایش.

**ڕفا:** فڕێندرا ف ربوده شد.

**ڕفان:** چاوگه بۆ فڕاندن ف ربایش.

**ڕفاندن:** فڕاندن ف ربودن.

**ڕفانك:** ڕف ف رف.

**ڕفاو:** فڕێندراو ف ربوده.

**رفت:** بارانی بەتەوژم، ڕێژنە ف رگبار شدید باران.

**ڕفته:** ڕفت ف رگبار شدید باران.

**ڕفحه:** ڕف ف رف.

**ڕفسه:** گیایەکە لە تیرەی کەماو بۆڕ ف گیاهی است برگ سوزنی.

**ڕفۆك:** چنگوڕك، چنگاڵی باڵداری گۆشت خۆر، چنگی دڕندە ف چنگ و پنجهٔ پرنده و درنده.

**ڕفه:** ١) ڕف؛ ٢) دارێكی كون كونە كە لە حەسیر چنینا بەكاری دەبەن ف ١) رف؛ ٢) چوبی كه در چیدن حصیر به‌كار برند.

**ڕفیاگ:** ڕفاو ف ربوده.

**ڕفێده:** دۆشەكۆڵە ئاساییە كە نانی پێ بە تەندورەوە دەدەن ف بالشتك نانوایی.

**ڕفیـن:** ١) ڕفان؛ ٢) باڵ گرتنەوە، فڕین ف ١) ربایش؛ ٢) پرواز.

**ڕفێـن:** ١) كەسێ شت دەڕفێنێ؛ ٢) كەسێ مەل هەڵـدەفـڕێنێ ف ١) رباینده؛ ٢) پرواز دهنده.

**ڕفێنی:** سماقی هەرەباش ف نوعی سماق ممتاز.

**ڕفیو:** فڕیو، هەڵفڕیو ف پرواز كرده.

**ڕڤین:** پیت، گڕی ئاگر ف زبانهٔ آتش.

**ڕق:** تووڕەیی، ڕك ف كینه.

**ڕقاوی:** ڕكوونی، دایم تووڕە ف كینه‌ور.

**ڕق‌ئەستـوور:** تووڕەیەك كە درەنگ ئاشـت دەبێتەوە ف خشمگیـن آشتی ناپذیر.

**ڕق‌جۆین:** تووڕەیی لەدڵدا ڕاگرتن ف كینه‌توز.

**ڕق‌خواردنـەوە:** تووڕەیی دەرنەخستن ف كینه در دل نگهداشتن، خشم فرو خوردن.

**ڕقدار:** ڕق‌ئەستوور ف آشتی ناپذیر.

**ڕق‌ڕقۆك:** جلكی تازەی بەخشەخش ف لباس تازهٔ خش‌خش كننده.

**ڕق گرتن:** تووڕەبوون ف به‌خشم آمدن.

**ڕق‌لەسك:** دەبنەوەبڕ ف كینه‌توز، تودار.

**ڕق لێ كێشان:** ڕق لە كەسێ دەدڵ گرتن ف كینه از كسی در دل گرفتن.

**ڕق‌لێ هەڵگرتن:** ڕق لێ كێشان ف كینه از كسی در دل گرفتن.

**ڕقن:** ڕقاوی، هەمیشە تووڕە ف اكثراً خشمگین.

**ڕقەبەری:** بەربەرەكانی كردن لە ناخۆشەویستی ف رقابت كینه‌توزانه.

**ڕق‌هەستان:** تووڕەبوون ف به‌خشم آمدن.

**ڕق‌هەستاندن:** تووڕەكردن ف به‌خشم آوردن.

**ڕق‌هەستاو:** تووڕەبوگ ف به‌خشم آمده.

**ڕق‌هەڵسان:** ڕق‌هەستان ف به خشم آمدن.

**ڕق‌هەڵساندن:** ڕق‌هەستاندن ف به‌خشم آوردن.

**ڕق‌هەڵستاندن:** ڕق‌هەستاندن ف به خشم آوردن.

**ڕك:** ١) هەورازی سەخـت و كـوور، ڕژد؛ ٢) بێـركـم، بەركـم، قەفـەس؛ ٣) هەوسـاری ملی بەرخ و گوێلك بۆ بەستنەوە؛ ٤) ئەستوورایی نێوان دەندە و باسكێش؛ ٥) ڕق، تووڕەیی ف ١) سر بالایی سخت و كوژ؛ ٢) قفس؛ ٣) رشتهٔ گردن بره و گوساله؛ ٤) ستبری میان گاوآهن و خیش؛ ٥) خشم.

**ڕكات:** لەتێك لە نوێژ: (نوێژی بەیانی دو **ڕكاته**) ف ركعت نماز.

**ڕكاكه:** بن‌كوڵ كردنی داری میوە، تەكمیش ف گود كردن پای درخت میوه.

**ڕكان:** باوەڕی، خاترجەمی لە كەسێك ف اعتماد.

**ڕكاوه:** گوندێكە لە ناوچەی پیران ف دهی است نزدیك پیرانشهر.

**ڕك‌بەڕكێ:** ڕقەبەری ف رقابت كینه‌ورانه، هم‌چشمی.

**ڕك‌بەڕكێنه:** ڕقەبەری ف نگا: ڕقەبەری.

**ڕك‌چـوون:** ١) دەڕقـەوە چوون؛ ٢) ئارام بونـەوە لە پاش تـووڕەبـوون ف ١) خشمگین شدن؛ ٢) دست از خشم برداشتن.

**ڕك‌دابردن:** ڕق‌هەستاندن ف به خشم آوردن.

**ڕك‌ڕكین:** چیرەچیری ددانان ف صدای به‌هم سائیدن دندانها.

**ڕك كردن:** تووڕەبوون و مان گرتن ف اعتصاب از فرط خشم.

**ڕككوو:** ڕكوونی ف كینه‌توز.

**ڕككه:** بێركم، قەفەز ف قفس.

**ڕككین:** ڕكوونی ف كینه‌توز.

**ڕك گرتن:** لەڕقان سووربوون لەسەر كارێك ف اصرار ورزیدن از كینه‌وری.

**ڕكن:** ڕقن ف نگا: ڕقن.

**ڕكو:** هەڵ لەرزین لە سەرمان یان لە ترسان ف لرزه از سرما یا ترس.

**ڕكۆ:** ڕقن ف اكثراً خشمگین.

**ڕكوونی:** ڕق‌لەسگ ف كینه‌توز، تودار.

**ڕكه:** ١) ملە، مل‌ملانێ، كێ‌بەركێ: (ئەو دو گوێ درێژە ڕكە دەكەن كێ زوتر سەركەوێ)؛ ٢) بێركم، قەفەس؛ ٣) هەورازی ڕك ف ١) رقابت، مسابقه؛ ٢) قفس؛ ٣) سر بالایی سخت و تیز.

**ڕكەبەری:** ڕقەبەری ف رقابت كینه‌توزانه.

**ڕكەنه:** تیخ لە پێستدان بۆ خوێن گرتن ف حجامت.

**ڕكیا:** تووڕەبو ف خشمگین شد.

**ڕكێشه:** گیایەكە بۆ برین گەیاندن دەكار دێ، ڕەكێشە ف گیاهی دارویی.

**ڕكێف:** ئاوزەنگی، زەنگو ف ركاب زین.

**ڕكێف دەوال:** قایشی ئاوزەنگی ف تسمهٔ بند ركاب.

**ڕكێـف كوت:** تاودانی ئەسپ لە لایەن سوارەوە ف اسب دوانیدن باشتاب.

**ڕكین:** ڕك هەستاو ف خشمگین.

**ڕكێو:** ڕكێف ف ركاب.

**ڕم**: ١) نێزەی درێژ، ڕمب؛ ٢) وشەی بنچینە بۆ ڕمان، ڕوخان ف ١) نیزۀ بلند؛ ٢) ریشۀ کلمۀ «ڕمان» بەمعنی فروریزی.

**ڕما**: تێك تەپی، ڕوخا: (دیوارەکە **ڕما**) ف فروریختن دیوار یا کوه.

**ڕماڵ**: زبڵ و زاڵ ف آت و آشغال.

**ڕمان**: ١) تێك تەپان، ڕوخان؛ ٢) مەڵبەندێکە لە کوردستان ف ١) فروریختن دیوار و...؛ ٢) منطقەای در کردستان.

**ڕماندن**: تێك تەپانن، ڕوخاندن ف ویران کردن، فروریزانیدن.

**ڕمانن**: ڕماندن ف نگا: ڕماندن.

**ڕمانە**: جۆرێ داسی دروێنەیە ف نوعی داس درو.

**ڕماو**: ڕوخاو، تێك تەپیو ف فروریختە، ویران شده.

**ڕمب**: ١) ڕم، نێزەی درێژ؛ ٢) دەنگی بەزەمین داکەوتنی شتی نەرمی زل ف ١) نیزۀ بلند؛ ٢) صدای افتادن چیزی سنگین و نرم.

**ڕمباز**: کەسێ لە ڕم بەکار هێناندا چێ یە ف نیزەباز ماهر.

**ڕمبازی**: ١) شەڕ بەڕم کردن؛ ٢) بە سواری لە مەیداندا هاتوچون ف ١) جنگ با نیزە؛ ٢) سوارە در میدان جولان دادن.

**ڕمبە**: دەنگی کەوتنی قورس بە سەر زەمین دا؛ ٢) دەنگی کوتانی دەهۆڵ؛ ٣) برێتی لە سازی و بەکەیفی: (هێند سازم هەر **ڕمبەم** دێت) ف ١) صدای افتادن چیز سنگین؛ ٢) صدای دهل از دور؛ ٣) کنایە از خوشحالی زیاد.

**ڕمبێز**: نێرتکە گیایەکی ترش و خۆشی کەمتەمەنە دەگەڵ بەفر چونەوە دەردەکەوێ، نێرتکی باسکڵاو، ڕێواس ف ریواس.

**ڕم بیشك**: تاوەی بچوکی بە دەسك لە چەندلاوە ف تابۀ کوچك دستەدار.

**ڕمژوە**: زۆرتاڵ، قوزە ڵقۆرت ف بسیار تلخ مزه.

**ڕمڵ**: تەم لە سەر چەم، ڕەشکەو پێشکە ف تیرگی چشم.

**ڕمۆ**: سو کەڵەناوی ڕەمەزان کە ناوی پیاو بێ ف مخفّف نام رمضان کە نام مردان باشد.

**ڕمودە**: ئالودە، خوپێ گرتو، هۆگر، ئۆگر ف خو گرفتە، الیف شده.

**ڕموزن**: مێردەزمە، دێوەزمە، جنۆکەی پیاوترسێن ف غول بیابان، دیو.

**ڕمە**: ڕمبە، دەنگی کەوتنی شتی قورس ف صدای افتادن جسم سنگین.

**ڕمی**: ١) گڕی ئاگر، پێت؛ ٢) ڕوخا ف ١) زبانۀ آتش؛ ٢) ویران شد.

**ڕمیاگ**: ڕماو ف فروریختە، ویران.

**ڕمیان**: ڕمان ف نگا: ڕمان.

**ڕمێز**: ڕمبێز، ڕێواس ف ریواس.

**ڕمین**: تێك تەپین، ڕوخان، هەڕفتن ف فروریختن، ویران شدن.

**ڕمێن**: ١) ڕوخێنەر، وێران کەر؛ ٢) برەو، ڕەواج: (زێڕ زۆر بە**ڕمێنە**) ف ١) ویران کننده؛ ٢) رواج.

**ڕن**: ١) کەرستەی بنەمای وشەی ڕنین کە بەدەست هەڵقەندنە؛ ٢) پاشگرێکە بەواتا: بەدەست هەڵکەن: (مۆڕن، بێستان **ڕن**)؛ ٣) ڕوشێن، کڕێن ف ١) مادە مصدر «ڕنین» کە بە معنی بادست کندن است؛ ٢) پسوند بەمعنی برچیدن با دست؛ ٣) خراشندە، حك کنندە.

**ڕنا**: ١) بەدەست هەڵکەندرا، بەدەست لێ کرایەوە؛ ٢) بەنینۆك بریندار کرا؛ ٣) کڕا ف ١) بادست چیدە شد؛ ٢) با ناخن خراشیدە شد؛ ٣) حك شد.

**ڕناو**: ١) بەدەست هەڵکەندراو؛ ٢) بەنینۆك زامارکراو، ڕشاو؛ ٣) کڕاو ف ١) چیدە با دست؛ ٢) خراشیدە با ناخن؛ ٣) حك شدە.

**ڕنای**: دڕاندن ف پارە کردن.

**ڕند**: ١) باش، پەسند؛ ٢) جوان، خوشیك، خوشکۆك ف ١) خوب و پسند؛ ٢) زیبا.

**ڕندو**: ڕنو، کەویەبەفر ف بهمن.

**ڕندی**: ١) پیاوچاکی، چاکەکاری، پیاوەتی، ٢) جوان چاکی ف ١) نکوکاری، مردمی؛ ٢) خوش قیافەای.

**ڕندێ**: ناوی کچانە، جوانێ ف نام زنانە.

**ڕندێن**: ئەڕدێن، ڕێش، ڕدێن ف موی زنخ، ریش.

**ڕنك**: لاسکە کەنگری ناسك کە دەخورێ ف ساقۀ کنگر سبز و نازك.

**ڕنکە**: ئامرازی دارتاش کە داری پێ لوس دەکا، ڕەندە ف رندۀ نجّاری.

**ڕنگ**: ١) هەنگوین و دۆشاوی پاڵێوراو؛ ٢) ڕەواقی هەنگوین؛ ٣) دەنگی کەوتنی شتی قورسی ڕەق ف ١) شیره و عسل صاف شده؛ ٢) شهد عسل؛ ٣) صدای افتادن جسم سنگین و سخت.

**ڕنگاڵ**: ١) هەنگوین و دۆشاوی پاڵاوتە، ڕنگ؛ ٢) ڕەواقی هەنگوین ف ١) شیره و عسل صاف شده؛ ٢) شهد.

**ڕنگان**: ١) پاڵاوتنی دۆشاو یان هەنگوین؛ ٢) قسەی بێ تام کردن ف ١) پالایش شیره یا عسل؛ ٢) یاوەگویی.

**ڕنگانەوە**: چەنەبازی زۆر و دوپاتەکردنەوەی قسەی بێ تام ف ژاژخایی، یاوەسرایی.

**ڕنگاو**: سرکە کە هێشوەترێی تێ دەخەن ف سرکە کە خوشە انگور در آن نگهدارند.

**ڕنگە**: ١) ڕنکە، ڕەندەی نەجاڕ؛ ٢) دەنگی کەوتنی قورسی ڕەق ف ١) رندۀ نجاری؛ ٢) صدای افتادن جسم سخت سنگین.

**ڕنگین**: ڕنگەلێ هاتن لە کەوتن دا ف صدا دادن جسم سنگین سخت در اثر افتادن.

**ڕنو**: کەویەبەفر، کڵێڵە، بەفری زۆر کە با ڕنیویەو لەسەریەکی کۆ کردۆتەوە ف بهمن.

**ڕنە**: ١) چنینی میوە؛ ٢) وەختی چنینی میوە؛ ٣) وردەبارانی کە ڕەشماڵ دای ئەدا؛ ٤) درمغ، خەپە؛ ٥) درونی گوڵی مەرەزە ف ١) چیدن میوه؛ ٢) موسم چیدن میوه؛ ٣) نم‌نم باران کە از سیاه چادر می‌تراود؛ ٤) شن‌کش؛ ٥) خوشە بریدن شالی.

**ڕنەك**: ١) بڕبەند؛ ٢) قەشەو، ئاسنێکی پڕ بەدەستی ددانەدارە ولاغی پێ دەخورێنن ف ١) سوهان؛ ٢) قشو.

**ڕنی**: ١) بەنینۆك زاماری کرد؛ ٢) کڕاندی؛ ٣) ڕنو؛ ٤) بەدەست هەڵی کەند ف ١) با ناخن خراشید؛ ٢) حك کرد؛ ٣) بهمن؛ ٤) با دست چید.

**ڕنیاگ**: ڕناو ف نگا: ڕناو.

**ڕنین**: ١) چنینەوە بەدەست؛ ٢) چڕنوك لێدان؛ ٣) کڕاندن ف ١) چیدن؛ ٢) خراشیدن با ناخن؛ ٣) حك کردن.

**رنینەوە:** ١) بەدەست هەڵکەندن؛ ٢) روشاندن: (روی خوی رنیەوە) ف ١) برکندن با دست، چیدن؛ ٢) خراشیدن با ناخن.

**رو:** ١) چروچاو، دیم؛ ٢) لای بەرچاو: (روی زەمین، روکەوا)؛ ٣) حەیا، شەرم: (پیاوێکی بێ‌روە)؛ ٤) دەخوڕادین: (روم نایە بی‌بینم)؛ ٥) حورمەت‌و پایە: (پیاوێکی زۆر بەروە لە دیواندا)؛ ٦) چەم، چوم؛ ٧) زەمینی سەخت. خار؛ ٨) بەفری سەهوڵ بەستوی رەق ف ١) چهره؛ ٢) رویه؛ ٣) شرم؛ ٤) جسارت؛ ٥) قدر و منزلت؛ ٦) رود؛ ٧) زمین سخت؛ ٨) برف یخ بسته.

**رۆ:** ١) رۆژی بەرانبەری شەو؛ ٢) وەخت‌و هەل: (ئەمرۆ رۆژی منە)؛ ٣) داخ‌و حەیف بۆ مردو: (هەی رۆ، ئەمرۆ رۆی شین‌و رۆ رۆمە) «پیرەمێرد»؛ ٤) جوگە؛ ٥) لوتکەناو کە سێ لای بەژ بێ ف ١) روز؛ ٢) موسم، فرصت؛ ٣) کلمهٔ شیون؛ ٤) جوی آب؛ ٥) خلیج.

**روئاوا:** خورنشین، زەردەپەڕ ف مغرب.

**روا:** چتر، رێوی؛ ٢) سەوزبو: (تۆکەی چاندم روا)؛ ٣) دوڕویی ف ١) روباه؛ ٢) رویید؛ ٣) ریا.

**رواباز:** دوڕو، روبین، ڕیایی کەر ف ریاکار.

**روار:** چوم، روبار ف رودبار، رود.

**رواس:** روا، چتر، رێوی ف روباه.

**رواسە:** رواس ف روباه.

**رواڵ:** ١) گەنجی مولێ نەهاتو، تازەجوان؛ ٢) لای بەرچاو؛ ٣) تەنشت، نزیك‌بە ف ١) نوجوان سادەرو؛ ٢) رویه؛ ٣) جنب و نزد.

**روالا:** چو، رۆیشت، رابرد ف رفت، گذشت.

**رواڵەت:** ١) دیمەن، ئەوەی لەبەرچاوە؛ ٢) دیم، دەم‌وچاو؛ ٣) روا، ڕیایی ف ١) ظاهر، ظاهری؛ ٢) چهره؛ ٣) ریا.

**رواڵەت‌باز:** ریاکار ف ریاکار.

**روان:** ١) چەند چوم؛ ٢) شین‌بونی چێنراو؛ ٣) ماکی وشەی بەواتا: تماشا: (چاوەروان بە، بروانە) ف ١) رودها؛ ٢) سبز شدن، روییدن؛ ٣) ریشهٔ روانین بەمعنی نگاه کردن.

**رواندن:** ١) چەقاندنی ڕیشەو شەتڵ؛ ٢) جێ‌بەجێ کردنی کار؛ ٣) وەدەرنان ف ١) رویانیدن؛ ٢) انجام دادن؛ ٣) راندن.

**روانگە:** جێگەیەك کە لێیەوە دەروانن ف مرصد، محل دیدەبانی.

**روانە:** بەرێ‌کراو، ناردراو ف روانە.

**روانەوە:** ١) توندبونەوەی دۆشاو یا هەرچی لە زۆر مانەوە؛ ٢) دوبارە سەوزبونەوە: (مێرگەکە رواوەتەوە) ف ١) غلیظ شدن مایع از ماندن زیاد؛ ٢) باز روییدن.

**روانی:** ١) تماشای کرد؛ ٢) بیری لێ کردەوە، بە بیری داهات ف ١) نگاه کرد؛ ٢) بەفکرش رسید.

**روانین:** تواشاکردن ف نگاه کردن.

**روئاوا:** ١) خورنشین، لای رۆژئاوا؛ ٢) دەمی زەردەپەڕ، نزیك بە شەو ف ١) باختر؛ ٢) هنگام غروب.

**رواو:** سەوزبوگ، شین‌بوگ ف روییده.

**رواوە:** دۆشاوی خەستەوەبوگ لەبەر مانەوەی زۆر ف شیرهٔ غلیظ شده از زیاد ماندن.

**روب:** رب، خەستەوە کراوی ئاوی میوە ف رب، چاشنی.

**روب:** سەرجلی بیجامەپوش ف بالاپوشی است.

**روبات:** ١) بۆسەی ڕاوکەر؛ ٢) حەشارگەی کەو ف ١) کمین شکار؛ ٢) کمینگاه کبك شکاری.

**روبادان:** رو لێ وەرگێران، خوتێ نەگەیاندن ف دخالت نکردن.

**روبار:** ١) چومی گەورە، چێم، چەم، شەت؛ ٢) روبەرو ف ١) رودبار؛ ٢) رودررری.

**روباربون:** روبەروبون، توشی یەك‌هاتن ف روبرو شدن.

**روباری حاجی ئەحمەد:** گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد ف نام روستایی در کردستان کە بعثیها ویران کردند.

**روباز:** رواباز، ڕیایی کەر ف ریاکار.

**روبازاری:** بەرمێن، برەودار ف مرغوب، رایج.

**روبازی:** روابازی، ریاکاری ف ریاکاری.

**روبال:** ١) روبار؛ ٢) سونگە، سەمەد: (روبالێ وی ئەو بەلا هاتە سەرێ من) ف ١) نگا: روبار؛ ٢) بە سبب.

**روبرو:** روبەرو ف روبرو.

**روبەر:** ١) بەرانبەر؛ ٢) پشتەلێفە ف ١) برابر؛ ٢) پشت لحاف.

**روبەرو:** روبار، روبال ف روبرو.

**روبەند:** پەچە، پێچە، پوشی ف روبندە.

**روبەنە:** روبەند ف روبندە.

**روبینی:** ١) مەرایی، ماستاوسارد کردنەوە؛ ٢) تارا لە سەر بوك هەڵدانەوە ف ١) ریا؛ ٢) روبند برداشتن از سر عروس.

**روپاك:** بە ئابرو ف آبرومند.

**روپاما:** کلکەسوتەکەر، مەرایی کەر ف متملّق.

**روپامایی:** کلکەسوتە، مەرایی ف تملّق.

**روپل:** پەرتوان، پەرینی لق ف هرس.

**روپلاندن:** پەرتاوتن، هەڵپەرتاوتن، پەراندنی لق‌و پوپی دار ف هرس کردن درخت.

**روپلیای:** برێتی لە مروڤی داوێن‌و قوڵ‌کورت ف کنایە از دامن و آستین کوتاه.

**روپەر:** یەك لای بەرچاو لە قاقەز، لاپەرە، لاپەر ف صفحهٔ کتاب و نوشتە.

**روپەری:** جوان چاك، زۆر خوشیك ف زیبا.

**روپەل:** روپەر ف نگا: روپەر.

**روپێدان:** قەدرگرتن ف با روی خوش پذیرفتن شخص.

**روپیو:** کەسێ کە زەوی لە گەز دەدا ف مسّاح.

**روت:** داردەستی درێژ، چەلاکی دەستی ف چوبدستی بلند.

**روت:** ١) بێ پوشاك، بێ‌بەرگ؛ ٢) برێتی لە نەدارو هەژار؛ ٣) روی تو ف ١) لخت، برهنە؛ ٢) کنایە از نادار و فقیر؛ ٣) صورتت.

**روتاڵ:** ١) زەوی گیالێ نەرواو، روتەن، قاقر؛ ٢) دەم‌و چاوگرژ ف ١) زمین لخت از گیاه؛ ٢) اخمو.

**روتان:** پوشەمەنی لەبەر دارنان ف برهنگی، پرکندگی.

**ڕوتاندن:** پۆشاك لەبەر داکەندن ف برهنه کردن، پرکندن.

**ڕوتـانـدنـەوە:** ١) ڕوتـاندن؛ ٢) بریتی لە شتی زۆر لێ ساندن: (کابرا ڕوتاندمیەوە) ف ١) برگ و پرکندن؛ ٢) کنایه از سوءاستفادهٔ مالی، دار و ندار کسی را گرفتن.

**ڕوتانن:** ڕوتاندن ف بی‌پوشاك و برگ کردن.

**ڕوتانەوە:** بێ پەڕوپۆ مانەوە، لەپەڕوپۆکەوتن ف بی‌برگ و پوشاك شدن.

**ڕوتاوە:** لەپەڕوپۆکراو ف پرکنده، برگ ریخته، از لباس لخت شده.

**ڕوت‌بوُن:** ١) بێ‌جلك‌بوُن؛ ٢) بێ‌پەڕبوُنی مەل؛ ٣) بێ‌مو بوُنی پێست؛ ٤) بریتی لە فەقیر بوُن ف ١) برهنگی؛ ٢) پرکندگی؛ ٣) موریختگی؛ ٤) کنایه از نداری.

**ڕوت بوُنەوە:** ڕوت‌بوُن ف نگا: ڕوت‌بوُن.

**ڕوترش:** ڕوتاڵ ف ترشروی.

**ڕوترشیاگ:** ڕوتاڵ ف ترشروی.

**ڕوتـك:** ١) چەڵاکی درێژ بۆ مازو چنین؛ ٢) ئاژەڵ یان مریشکی ڕوتەوە بوُگ ف ١) چوبی بلند برای چیدن ثمر مازوج؛ ٢) پاك شدن دام و طیور از مو یا پَر.

**ڕوتك:** ١) جۆرێ برنج؛ ٢) جۆرێ پارچەی کەم‌نرخ کە دەکرێتە چارۆکە ف ١) نوعی برنج؛ ٢) نوعی قماش ارزان.

**ڕوت‌کردن:** ١) جلك لێ داڕنین؛ ٢) تاڵانی چەتە؛ ٣) بێ گەڵاکردن ف ١) برهنه‌کردن؛ ٢) لخت کردن از دارایی؛ ٣) برگ کندن.

**ڕوت کردنەوە:** جلك و بەرگ لێ کردنەوە ف برهنه‌کردن.

**ڕوت کرن:** ڕوت کردن ف نگا: ڕوت کردن.

**ڕوت‌ورەجاڵ:** ١) هەژار، نەدار؛ ٢) حەشاماتی بی‌ناوی کەس‌نەناس ف ١) فقیر؛ ٢) رجّاله و هرجایی.

**ڕوت‌وقوت:** ١) هیچ دەبەردانە؛ ٢) بێ هیچ دارایی: (لە ڕوت‌وقوتی وەك من ڕو مەپـۆشـە / کە قـوتی ڕوتە قوتی عاشقـی ڕوت) «نالـی» ف ١) لخت مادرزاد؛ ٢) ندار.

**ڕوتـە:** ١) کەسێ کە هیچ شك نابـا؛ ٢) بێ نـمـودی پوُتەکە ف ١) لات آسمان‌جل؛ ٢) حقیر بی‌نمود.

**ڕوتەحل:** ڕوتاڵ، ڕوگرژ ف اخمو.

**ڕوتەخت:** بریتی لە بێ‌شەرم و ڕوهەڵماڵاو ف پرروی بی‌حیا.

**ڕوتەڵ:** ڕوتە ف نگا: ڕوتە.

**ڕوتـەڵە:** ١) پوُتەکەی بێ‌نمود؛ ٢) ئاژەڵی توُك لێ‌وەریو ف ١) بی‌نمود حقیر؛ ٢) حیوان مو ریخته.

**ڕوتەن:** زەوی کە گیای لێ نەڕواوە، ڕوتاڵ ف زمین بی‌گیاه.

**ڕوتەنك:** ١) بەشەرم، خەجاڵەتی؛ ٢) هەرشتی وەك شوشە ئەودیوی لێ دیار بێ ف ١) خجالتی؛ ٢) شفاف.

**ڕوتەنی:** ڕوتەن ف زمین بی‌گیاه.

**ڕوتەوبون:** ڕوت‌بوُنەوە، ڕوت‌بوُن ف نگا: ڕوت‌بوُن.

**ڕوتەوکردن:** ڕوت‌کردنەوە، ڕوت‌کردن ف نگا: ڕوت کردن.

**ڕوتەوەبون:** ڕوت‌بون، ڕوت بوُنەوە ف نگا: ڕوت‌بوُن.

**ڕوتەوە کردن:** ڕوت‌کردن، ڕوت‌کردنەوە ف نگا: ڕوت‌کردن.

**ڕوتی:** ١) بێ‌بەرگی؛ ٢) فەقیری و هەژاری ف ١) لختی؛ ٢) ناداری.

**ڕوتیانەوە:** ڕوتانەوە ف نگا: ڕوتانەوە.

**ڕوتێ کـردن:** ١) لە ڕوی کەسێ قسـەکـردن: (ڕوم تێ کـردو گوتم)؛ ٢) بەرەو جێ یان کەسێ ڕۆیشـتـن؛ ٣) توش‌هاتـنـی خۆشـی یان ناخـۆشی: (بـەخت ڕوی‌تێ‌کرد، نەگبەتی ڕوی تێ کردوە) ف ١) مخاطب قرار دادن؛ ٢) رونمودن به جایی؛ ٣) رونمودن شانس یا نکبت.

**ڕوچ:** ١) خوَر؛ ٢) ڕوَ، بەرانبەری شەو ف ١) آفتاب؛ ٢) روز.

**ڕوچیار:** ١) خوَر؛ ٢) ڕۆژگار، زەمانە ف ١) آفتاب؛ ٢) زمانه، روزگار.

**ڕوچیارپەرست:** گوڵەبەڕۆژە ف گل آفتاب‌گردان.

**ڕوچ:** ڕوچ ف نگا: ڕوچ.

**ڕوچك:** چرۆچاو، ڕوُ ف چهره.

**ڕوچکان:** ڕوتانەوەی مەل لە پەڕ و پۆ ف پرکندگی برنده.

**ڕوچـن:** ١) کونی دیوار یان سەربان کە تیشکـەی ڕۆژی پێدا دێتە ژوُر؛ ٢) بەرانبەری تاریك، ڕوُناك، ڕوشن ف ١) روزنه؛ ٢) روشن.

**ڕوچنایی:** بەرانبەری تاریکی، ڕوُناکی ف روشنایی.

**ڕوچنە:** کونی ماڵ بۆ ڕوچنایی، ڕوچن ف روزنه.

**ڕوچـوُن:** ١) قوپان، داچوُن: (سەربانەکە ڕوچـوە)؛ ٢) تێك ڕوُخـان ف ١) فرورفتگی؛ ٢) فروریختگی دیوار یا خانه.

**ڕوچە:** بەڕۆژ هیچ نەخواردن، ڕۆژوُ، ڕۆژگ ف روزه.

**ڕوچەوان:** بەڕۆژوُ ف روزه‌دار.

**ڕوچێ:** ڕوچە ف روزه.

**ڕوچیار:** ڕوجیار ف نگا: ڕوجیار.

**ڕوچیارپەرس:** ڕوجیارپەرست ف گل آفتابگردان.

**ڕوچینك:** ڕوچنە ف روزنه.

**ڕوح:** ڕح، گیانی گیاندار ف روح.

**ڕوح:** ڕح ف روح.

**ڕوح‌توتیا:** کانزایەکە نەرم ف فلزی معدنی است.

**ڕوح‌چوُن:** بریتی لە ترسی زۆر، زاڵەترەك بون ف زهره‌ترك شدن.

**ڕوح دەبەر:** زیندەوەر، خاوەن‌ژی ف جانور، جاندار.

**ڕوح‌زل:** خۆبین، بەفیز، بەدەعیە ف کنایه از متکبّر.

**ڕوح‌لەبەر:** ڕوح‌دەبەر ف جاندار.

**ڕوخ:** قەراغ، لێوارە، دەم‌چەم ف کرانه، کناره.

**ڕوُخار:** ١) بریتی لە شەرمەزار؛ ٢) مل‌کەج ف ١) کنایه از شرمسار؛ ٢) گردن کج.

**ڕوُخان:** ڕمان ف فروریختن دیوار یا خانه.

**ڕوُخاندن:** ڕمانن ف فروریزاندن، خراب کردن.

**ڕوُخانن:** ڕوُخاندن ف فروریزاندن، خراب کردن.

**ڕوُخـانـە:** ١) چۆم، چێـم، ڕو؛ ٢) بەست، بەستێـن ف ١) رودخـانـه؛ ٢) زمینهای کنار رودخانه.

**ڕوُخاو:** ڕمیاو ف خراب شده، منهدم.

**ڕوخس:** نیشتنی شەکر لە ژێر شتی شیریندا وەك مرەباو... ف تەنشین

شدن شکر در شربت و...

**ڕۆخسار:** چرۆچاو، دەموچاو، ڕۆ، دیم ف رخساره.

**ڕۆخلە:** ڕیخۆڵە ف روده.

**ڕۆخۆش:** خۆشڕۆ، دەم بەپێکەنین، دژی ترشڕۆ ف خوشروی.

**ڕۆخە:** ١) نزیك بە ڕمان، لەسەر ڕۆخان؛ ٢) ڕۆچوگ ف ١) آمادهٔ فروریختن؛ ٢) فرورفتگی زمین.

**ڕۆخەك:** ڕۆخە ف نگا: ڕۆخە.

**ڕۆخیاگ:** ڕۆخاو ف نگا: ڕۆخاو.

**ڕۆخیان:** ڕۆخان ف نگا: ڕۆخان.

**ڕۆدار:** ١) بەقەدرو حورمەت؛ ٢) بوێر، بێ‌ترس ف ١) محترم؛ ٢) نترس.

**ڕۆدامالاو:** بێ‌شەرم و بێ‌حەیا ف بی‌آزرم.

**ڕۆدامالراو:** ڕۆدامالاو ف بی‌آزرم.

**ڕۆدامالیاگ:** ڕۆدامالاو ف بی‌آزرم.

**ڕۆدان:** ١) قومان، بەسەرهات؛ ٢) خۆش ویستن و لاواندنەوە ف ١) روی دادن، حدوث؛ ٢) نوازش و روی خوش نشان دادن.

**ڕۆداو:** بەسەرهات، قومیاو ف رویداد.

**ڕۆدای:** ڕۆداو ف رویداد.

**ڕۆدرژ:** ڕۆترش، ڕۆگرژ ف اخمو.

**ڕۆدەربایس:** بەڕۆتەنك، خەجاڵەت لە ڕوی خەڵکا ف کم‌رو، خجالتی.

**ڕۆدەربایست:** ڕۆدەربایس ف کم‌رو، خجالتی.

**ڕۆدەربایستی:** کەم‌ڕۆیی ف کم‌رویی.

**ڕۆدەربایسی:** کەم‌ڕۆیی، شەرمنی لە قسەکردندا ف کم‌رویی.

**ڕۆدی:** ڕۆخلە، ڕیخۆڵە ف روده.

**ڕۆدین:** میزەڵدان ف مثانه.

**ڕوراست:** قسەی بێ پەناو پەسیو ف رك و صریح.

**ڕوروو:** وشەیەکە شین گێڕ دەیڵێن، ڕۆڕۆ ف کلمهٔ نوحه برای مرده.

**ڕۆرەش:** بریتی لە گوناحبار، فەدیکار، شەرمەزار، خەجاڵەت ف کنایه از گناهکار، روسیاه، خجل.

**ڕۆرەشی:** تاوانبـاری، گونـاحکـاری، خەجـاڵـەتی، شەرمـەزاری ف روسیاهی، کنایه از گناهکاری، شرمساری.

**ڕۆریس:** گیایەکی ڕەنگ سوورە سابونکەر دەکاری دێنن ف گیاهی است.

**ڕۆز:** پێکەوە نوساندنی پارچەی بڕاو بە نامانەت ف برهم دوختهٔ برش، پرو.

**ڕۆزقە:** گیایەکە ئەخورێ ف گیاهی است خوردنی.

**ڕۆزگار:** ڕۆجیار ف روزگار.

**ڕۆزنامە:** نوسراوێ کە دەنگ‌وباسی ڕۆژانەی تێدایە ف روزنامه.

**ڕۆزە:** ١) کەچ و کروچ و ژەنگاوی؛ ٢) دەم و چاو ئاولاوی ف ١) فرسوده و زنگارزده؛ ٢) آبله‌گون.

**ڕۆزەر:** بریتی لە خەجاڵەت، شەرمەزار ف کنایه از شرمنده.

**ڕۆزەرد:** ڕۆزەر ف کنایه از شرمنده.

**ڕۆزەردی:** خەجاڵەتی، شەرمەزاری ف شرمندگی.

**ڕۆزەری:** جوانـی سەوزەڕەنگ، پێستسپی ئامـاڵ زەرد ف رخسار سبزه‌رنگ.

**ڕۆزەلە:** ڕۆزەی گچکەو بێ نمود ف فرسودهٔ زنگ‌زده.

**ڕۆزی:** ڕسق، بژیوی خواداو ف روزی.

**ڕۆژ:** ١) ڕۆ، بەرانبەری شەو؛ ٢) خۆر ف ١) روز؛ ٢) آفتاب.

**ڕۆژئەژمێر:** ساڵ یێو، تەقویم ف سالنامه، تقویم.

**ڕۆژاپاشین:** سەلا، قیامەت ف قیامت.

**ڕۆژابەسلانێ:** ڕۆژاپاشین ف قیامت.

**ڕۆژاسلاتێ:** ڕۆژاپاشین ف قیامت.

**ڕۆژاڤا:** ١) خۆرنشین؛ ٢) زەردەپەڕ ف ١) غرب؛ ٢) غروب.

**ڕۆژاڤایی:** خەڵکی ولاتی خۆرنشین ف غربی.

**ڕۆژانـو:** ١) خۆری تازەهـەلاتـو؛ ٢) ڕۆژی نوێ؛ ٣) ناوی گۆڤـارێکی کوردی بو ف ١) آفتاب تازه سرزده؛ ٢) روز نو؛ ٣) نام مجله‌ای کردی.

**ڕۆژانە:** ١) لەکاتی ڕۆژدا؛ ٢) کرێی ڕۆژ بەڕۆژ ف ١) در روز؛ ٢) یومیّه، روزمزد.

**ڕۆژاوا:** ڕۆژاڤا ف نگا: ڕۆژاڤا.

**ڕۆژاوایی:** ڕۆژاڤایی ف نگا: ڕۆژاڤایی.

**ڕۆژباش:** وشەی توش‌بونی ئاشنا لە ڕۆژدا ف روزبخیر.

**ڕۆژبڕ:** کرێی ڕۆژبەڕۆژ، ڕۆژانە ف روزمزد.

**ڕۆژبرن:** تاوبردن، تاوانگازی ف آفتابزدگی.

**ڕۆژبژێر:** ڕۆژ ئەژمێر، ساڵ یێو ف تقویم.

**ڕۆژبونەوە:** سەرەتای بەیان، شەوەکی، بەرەبەیان ف اول فجر، دمیدن صبح.

**ڕۆژبەڕۆژ:** ڕۆژ لە دوای ڕۆژ، هەموڕۆژ ف روزبروز.

**ڕۆژبەسەربردن:** ڕابواردنی ڕۆژگار ف روزگار گذرانیدن.

**ڕۆژبەیانی:** هۆزێکە لە کوردستان ف عشیرتی است.

**ڕۆژپەڕ:** نێواری درەنگ، دەمی ڕۆژاوا ف وقت غروب.

**ڕۆژپەرست:** خمخـوگ، خمەگرو ف حربـا، نوعی سوسمـار، آفتاب‌پرست.

**ڕۆژتا:** نۆبەتێ کە هەربەڕۆژە، بەرانبەری شەوتا ف تب روزانه.

**ڕۆژداگەڕان:** کەمێ پاش نیوەڕۆ ف وقت زوال.

**ڕۆژداگەڕیان:** ڕۆژداگەڕان ف وقت زوال.

**ڕۆژڕەش:** بەدبەخت، چارەڕەش ف سیه‌روز.

**ڕۆژڕەشی:** بەدبەختی ف سیه‌روزی.

**ڕۆژژمێر:** ڕۆژئەژمێر، ساڵ یێو ف سالنامه.

**ڕۆژقەتاندن:** ڕۆژبەسەربردن ف روزگذراندن.

**ڕۆژکان:** هۆزێکی کوردە ف عشیره‌ای است.

**ڕۆژکـردنـەوە:** ١) شەوبەسـەر بردن؛ ٢) بریتی لە شەو نەنوستـن ف ١) شب گذراندن؛ ٢) کنایه از شب‌بیداری.

**ڕۆژکی:** هۆزەکی کوردە ف عشیرتی است.

**ڕۆژگ:** ڕۆچە ف ڕوزە.
**ڕۆژگار:** ۱) ڕۆجیار، ڕۆچیار؛ ۲) بەڕۆژ تا شەو ف ۱) روزگار؛ ۲) روزانە.
**ڕۆژگارپەرست:** ڕۆجیارپەرست ف گل آفتابگردان.
**ڕۆژگاز:** تاوەنگاز، تاوانگاز ف آفتابزدە.
**ڕۆژگەز:** ڕۆژگاز ف آفتابزدە.
**ڕۆژگەستن:** تاوانگازی ف آفتابزدگی.
**ڕۆژگەستی:** تاوبردو ف آفتابزدە.
**ڕۆژگەوان:** ڕۆچەوان، بەڕۆژو ف روزەدار.
**ڕۆژگیران:** دەمێ کە مانگ دەکەوێتە نێوان زەمین و ڕۆژ ف کسوف.
**ڕۆژمز:** ڕۆژبڕ، کرای ڕۆژانە ف روزمزد.
**ڕۆژمزە:** ڕۆژمز ف روزمزد.
**ڕۆژمژ:** ڕۆژمز ف روزمزد.
**ڕۆژمێر:** ساڵ پێو، تەقمین، تەقویم، ڕۆژنەژمێر ف سالنامە، تقویم سال.
**ڕۆژن:** ڕۆچن، ڕۆچنە ف روزنە.
**ڕۆژناڕۆژ:** ڕۆژێك وێستان و ڕۆژێك کردن ف یك روز در میان.
**ڕۆژنامە:** ڕۆزنامە ف روزنامە.
**ڕۆژنامەچی:** کەسێ کار لە ڕۆژنامەدا دەکا ف کارمند روزنامە.
**ڕۆژنامەنوس:** کەسێ ڕۆزنامە دەنوسێ ف روزنامەنگار.
**ڕۆژناهی:** دژی تاریکایی، ڕۆشنایی، ڕوناکی ف روشنایی.
**ڕۆژنایی:** ڕۆژناهی ف روشنایی.
**ڕۆژنشین:** خۆرنشین، خۆراوا ف باختر.
**ڕۆژنە:** ڕۆچنە ف روزنە.
**ڕۆژو:** ڕۆژگ، ڕۆچە ف روزە.
**ڕۆژوخواردن:** ڕۆژو نەگرتن، بەڕۆژونەبون ف روزەخواری.
**ڕۆژوخۆر:** کەسێ کە بەڕۆژو نابی ف روزەخوار.
**ڕۆژوشکاندن:** ڕۆژوخواردن ف روزەخواری.
**ڕۆژوکردنەوە:** بەربانگ کردنەوە، شتخواردن دوای تەواوبونی ڕۆژو ف افطار.
**ڕۆژوگر:** کەسێ کە وەڕۆژگ ئەوێ ف روزەگیر.
**ڕۆژوگرتن:** وەڕۆژگ بون ف روزەگیری.
**ڕۆژوەوان:** ڕۆچەوان ف روزەدار.
**ڕۆژە:** ئەڵماس ف الماس.
**ڕۆژەجوت:** بەشی کێڵانی ڕۆژێك لە زەوی ف جای شخم زدن در یك روز.
**ڕۆژەڕێ:** ڕێگەی ڕۆژێك بە پیادەیی ف یکروزە راه.
**ڕۆژەکی:** ۱) ڕۆژکی، هۆزێکی کوردە؛ ۲) ڕۆژێك لە ڕۆژان ف ۱) عشیرتی است؛ ۲) روزی، یك روز.
**ڕۆژەن:** ڕۆچن، ڕۆچنە، ڕۆژنە ف روزنە.
**ڕۆژەلات:** خاوەر، خۆرهەلات ف مشرق.
**ڕۆژهەلات:** ڕۆژەلات ف خاور.
**ڕۆژی:** ۱) ڕۆژگ؛ ۲) ڕۆزی، ڕسق ف ۱) روزە؛ ۲) روزی، رزق.
**ڕۆژی بەرێ:** ڕۆزی هەوەڵێ، ڕۆژی ئەزەلێ ف روز اول، روز ازل.
**ڕۆژی پساتێ:** ڕۆژا پەسلانێ ف روز قیامت.
**ڕۆژی پەسلان:** ڕۆژا پەسلانێ ف روز قیامت.
**ڕۆژیك:** نیسك ف عدس.
**ڕۆژینگ:** ۱) موغاری؛ ۲) کونی بەرزی دوکەڵ کێش ف ۱) بخاری؛ ۲) دودکش.
**ڕۆژینە:** ڕۆژانە، کرێی ڕۆژ بە ڕۆژ ف روزانە.
**ڕوس:** ۱) ڕوت، بێبەرگ؛ ۲) تیژ لە چێژەدا؛ ۳) خەڵکی ڕوسییە ف ۱) لخت؛ ۲) تندمزە؛ ۳) روسی، اهل روسیە.
**ڕوسارد:** بریتی لە گوێ پێ نەدان، ڕونەدان: (چومەلای بەڕوساردی بەخێری هێنام) ف کنایە از بیمبالات.
**ڕوساردی:** گوێ پێ نەدان ف بیمبالاتی.
**ڕوسپی:** ۱) سەربەرز، مرۆی بەئابڕو؛ ۲) جندە ف ۱) روسفید، آبرومند؛ ۲) فاحشە.
**ڕوسپی کردنەوە:** ۱) کاری باش و هونەراوی کردن؛ ۲) ئابڕو کڕینەوە ف ۱) کار خوب و هنرمندانە کردن؛ ۲) اعادۀ حیثیت کردن.
**ڕوسپیەتی:** ۱) خوێنی نیشانەی کیژبونی بوك؛ ۲) جندەیی ف ۱) نشانۀ بکارت عروس؛ ۲) فاحشگی.
**ڕوست:** ئاوایی جگە لە شار، دێ؛ ۲) ناوی گوندێکە لە کوردستان ف ۱) روستا؛ ۲) نام دهی است.
**ڕوسور:** مرۆی بێعیب و عار، سەربەرز و بەئابڕو، ڕوسپی ف دور از کار ننگین، روسفید.
**ڕوسوری:** ئابڕومەندی ف آبرومندی.
**ڕوسە:** بن خەرمان ف باقیماندۀ خرمن کە فقرا جمع می کنند.
**ڕوسەخت:** ۱) سەربڵند، ڕوسور؛ ۲) ڕوداماڵاو، بێشەرم ف ۱) روسفید در زندگی؛ ۲) پررو.
**ڕوسەری:** دەسماڵی سەر، سەرپۆشی ژنانە ف روسری.
**ڕوسیا:** ۱) شەرمەزار، خەجاڵەت؛ ۲) ئابڕوتکاو، ناوزڕاو ف ۱) شرمسار؛ ۲) رسوا.
**ڕوش:** ۱) شوێنی باریك و سەرچڵ لە توێخی سەرەوەی شتدا: (دەستم ڕوشاوە، شوشە ڕوشا، سواغەکە ڕوشاوە)؛ ۲) مرۆی شەڕانی و نەگونجاو؛ ۳) درشت، زبر؛ ۴) ئاوڵاوی، ڕوزە؛ ۵) جۆرێ بەری دارمازو؛ ۶) تیزماڵکی دار؛ ۷) تاڵی کەنارەی پارچە، ڕیشو ف ۱) خراش؛ ۲) تندخوی؛ ۳) خشن، زبر؛ ۴) آبلەگون؛ ۵) نوعی ثمر مازوج؛ ۶) پرز چوب؛ ۷) پرز کنارە پارچە.
**ڕوشان:** برینداربونی سەرچڵ ف خراش بردن.
**ڕوشاندن:** سەرچڵ بریندارکردن ف خراشیدن.
**ڕوشاو:** سەرچڵ بریندارکراو ف خراشیدە.
**ڕوشاوی:** بریندارکراو بەسەرچڵی ف دارای خراشها.
**ڕوشتە:** ڕستە، ڕشتە، ڕشدە، هەڕشتە ف رشتۀ آش.
**ڕوشکان:** خەجاڵەت بون ف خجلت، از رو رفتن.
**ڕوشکاندن:** خەجاڵەت کردن، تەریق کردنەوە ف خجل کردن، از رو بردن.
**ڕوشکانن:** ڕوشکاندن ف نگا: ڕوشکاندن.

**ڕۆشکێن:** تەریق کەرەوە، تەریق کەر [ف] خجالت دهنده، ازرو برنده.
**ڕۆشکێنی:** کاری ڕۆشکێن [ف] خجلت دهندگی، از رو بردن.
**ڕۆشن:** ۱) بەرانبەری تاریك، ڕوناك؛ ۲) بریتی لە دیارو زانراو؛ ۳) ئاگری هەڵکراو [ف] ۱) روشن؛ ۲) معلوم؛ ۳) افروخته.
**ڕۆشن:** مرۆی بەدفەڕی شەڕانی [ف] ستیزه‌جوی، بدخوی.
**ڕۆشنا:** ۱) ڕۆشن؛ ۲) ناسیاو، دۆست، دوای وشەی ئاشنا دێت: (ئاشناو ڕۆشنامان زۆرن) [ف] ۱) روشن؛ ۲) آشنا.
**ڕۆشناکی:** ڕوناکی [ف] روشنایی.
**ڕۆشنایی:** ۱) بەرانبەری تاریکی، ڕوناکایی؛ ۲) ناسیاوی [ف] ۱) روشنایی؛ ۲) دوستی، آشنایی.
**ڕۆشن بونەوە:** ۱) دیاردان، دیاری‌دان؛ ۲) گەشانەوەی ئاگر [ف] ۱) معلوم شدن؛ ۲) برافروختگی مجدّد آتش.
**ڕۆشن‌بیر:** زانا بەدابی زەمان، تێ گەیشتوی پێ گەیشتو [ف] روشنفکر.
**ڕۆشن کردن:** ۱) دیارکردنی نەزانراو؛ ۲) هەڵ کردنی ئاگر [ف] ۱) معلوم کردن؛ ۲) افروختن.
**ڕۆشن کردنەوە:** ۱) دیارکردنی نەزانراو، شی کردنەوە؛ ۲) هەڵکردنەوەی ئاگر، گەشاندنەوە [ف] ۱) معلوم کردن، توضیح دادن؛ ۲) برافروختن مجدّد آتش.
**ڕۆشنی:** ۱) ئاشکرایی، دیاری؛ ۲) دژی تاریکی، ڕوناکی [ف] ۱) آشکارا؛ ۲) روشنی.
**ڕۆشە:** ۱) ڕۆش؛ ۲) ڕۆزە؛ ۳) بەڵاو بەسەرهاتی خراپ [ف] ۱) نگا: ڕۆش؛ ۲) زنگزده، آبله‌گون؛ ۳) مصیبت وارده.
**ڕۆشیان:** ڕۆشان [ف] خراش بردن.
**ڕۆشین:** ڕۆشان [ف] خراش بردن.
**ڕۆشێن:** کەسێ یا شتێ کە ئەڕۆشێنێ [ف] خراشنده.
**ڕۆغان:** دوهن، ڕۆن، ڕۆن [ف] روغن.
**ڕۆڤ:** تۆکە بەر [ف] موی زهار.
**ڕۆڤلك:** تۆکەبەر، موی بەرگەدە [ف] موی زهار.
**ڕۆڤە:** کڕێوەو بادەوە، باسریشك [ف] کولاك.
**ڕۆڤی:** ڕێوی، ڕواس [ف] روباه.
**ڕۆڤی:** ۱) ڕوخڵە، ڕیخۆڵە، ڕۆدی؛ ۲) روڤی [ف] ۱) روده؛ ۲) روباه.
**ڕۆڤی:** ۱) ڕوخڵە؛ ۲) چتر، ڕواس، ڕوا، ڕێوی [ف] ۱) روده؛ ۲) روباه.
**ڕۆڤی ڕەش:** ڕێڵە خۆی گەورە [ف] رودهٔ بزرگ.
**ڕۆڤی زراڤ:** ڕێڵە خۆی بچوك [ف] رودهٔ کوچك.
**ڕۆڤی ستور:** ڕۆڤی ڕەش [ف] رودهٔ بزرگ.
**ڕۆڤی کوێر:** ڕێڵە خۆی کوێرە [ف] رودهٔ کور.
**ڕۆق:** شۆربە، چێشتی تراو [ف] شوربا، آش مایع.
**ڕۆقاو:** ئاوی پاشماوەی چێشتی تراو [ف] پساب آش مایع.
**ڕۆقایم:** بێ‌شەرم لە قسەدا [ف] پررو.
**ڕۆقە:** ڕۆقاو [ف] نگا: ڕۆقاو.
**ڕۆقەرمچی:** چڕو چاو چرچ و لۆچ [ف] رخسار پرچین و چروك.
**ڕوك:** ۱) پاشگر بە واتا: کاکڵ، ناوئاخن: (ناوەڕوك)؛ ۲) چنین بۆمیوە: (پاشەڕوك) [ف] ۱) محتوا، هسته؛ ۲) چیدنی میوه.
**ڕۆك:** ۱) چڕوچاو، ڕوخسار؛ ۲) ڕۆتش، شوێنی باریك بەسەرچڵی برینداو [ف] ۱) چهره؛ ۲) خراش.
**ڕۆکار:** ۱) دیار، لەبەرچاو؛ ۲) بەرانبەر: (ڕۆکاری خانو، لە ڕۆکاری گوند)؛ ۳) توێخی سەرەوە: (ڕۆکاری زەمین)؛ ۴) کاری کراوی دیار [ف] ۱) نما؛ ۲) نزدیك، مقابل؛ ۳) سطح، رویه؛ ۴) انجام آشکار کار.
**ڕۆکان:** ڕۆشان، داڕۆشان [ف] خراش برداشتن.
**ڕۆکانن:** ڕۆشاندن، داڕۆشاندن [ف] خراشیدن.
**ڕۆکران:** بەرەوژێر ڕژانی شتی ورد یان تراو [ف] فروریختن اجسام ریز یا مایع.
**ڕۆکرانەوە:** لە شەرمنی ڕزگاربون [ف] از خجالت رها شدن.
**ڕۆکراو:** بەرەوژێر داڕژاوی شتی وردە یان تراو [ف] مایع یا اشیاء ریز فروریخته.
**ڕۆکراوە:** ۱) ڕوخۆش؛ ۲) شەرم نەکەر لە خەڵك بۆ قسەو ڕوبەڕوبون [ف] ۱) خوشروی؛ ۲) دور از خجالت، چشم و گوش بازشده.
**ڕۆکردن:** بەرەوژێر ڕژاندنی شتی ورد یان تراو [ف] فروریزاندن اجسام ریز یا مایع.
**ڕۆکردن:** ۱) بەرەو شوێنێ چون؛ ۲) شەرم کردن؛ ۳) ڕوتێ کردن بۆ دواندن؛ ۴) دەرخستن، نیشان‌دان: (ئەگەر پوڵت هەس ڕوی کە) [ف] ۱) توجه؛ ۲) شرم کردن؛ ۳) روی گفتار درمخاطب کردن؛ ۴) رو کردن، نشان دادن.
**ڕۆکردنەوە:** ڕۆکرانەوە [ف] نگا: ڕۆکرانەوە.
**ڕۆکرن:** ڕۆکردن [ف] نگا: ڕۆکردن.
**ڕۆکرن:** شەرمکردن [ف] شرم کردن.
**ڕۆکە:** ڕۆش، ڕۆشان، داڕۆش [ف] خراش.
**ڕۆکەتن:** تاو هەڵاتن، خۆر کەفتن [ف] طلوع آفتاب.
**ڕۆکەش:** ڕوکێش، جۆرێ دەفرە کە دوتوێیە [ف] ظرف فلزی لعاب‌دار، روکش.
**ڕۆکەن:** روخۆش، دەم بە پێخەنین [ف] خنده‌رو.
**ڕۆکەوتن:** ئیسراحەت کردن، پاڵدانەوەو پشودان [ف] تکیه دادن، آسودن.
**ڕۆکیان:** ڕوکەداربون، ڕۆشان [ف] خراش برداشتن.
**ڕۆکێش:** دەفری دوتوێ، ڕۆکەش [ف] نگا: ڕۆکەش.
**ڕۆگ:** شیلەی ترێی کوڵاو، ڕب [ف] رب، چاشنی.
**ڕۆگر:** شەرمێون، ژنی بەحەیا [ف] آزرمجو، زن باحجاب.
**ڕۆگرتن:** ۱) شەرم کردن؛ ۲) توندبونی شیری هەوێن کراو [ف] ۱) شرم نمودن؛ ۲) بندآمدن شیر مایه‌زده.
**ڕۆگرتی:** شیری بەندهاتگ [ف] شیر بندآمدهٔ مایه‌زده.
**ڕۆگرژ:** ڕۆتاڵ، ڕۆترش [ف] اخمو.
**ڕۆگە:** شوێنێ کە زۆرکەس ڕوی تێ‌دەکەن، قوبڵە، قیبلە [ف] قبله.
**ڕۆگەش:** ڕوخۆش، دەم بەپێکەنین [ف] خوشروی.
**ڕۆگیر:** ۱) تۆڕە، قەڵس؛ ۲) تەریق، خەجاڵەت [ف] ۱) قهر کرده؛ ۲) خجلت زده.

**ڕێ‌دەرکردن:** بەڕێگەزانین **فا** بلدبودن راه.

**ڕێرەو:** ١) بەھەڵکەوت: (بەڕێ‌ڕەوی تووشی بووم)؛ ٢) ڕێبوار **فا** ١) اتفاقی؛ ٢) رهرو.

**ڕێرێ:** خەت‌خەت **فا** راه‌راه، شیارشیار.

**ڕێز:** ١) قەدرو حورمەت؛ ٢) بەتەنشت یەکەوە، سەف؛ ٣) خیز، چەو؛ ٤) خەتێك لە نووسین، دێڕ؛ ٥) پاژ؛ ٦) پاشگری بەواتا: ڕێژ لە ڕژاندن **فا** ١) احترام؛ ٢) صف، ردیف؛ ٣) شن؛ ٤) سطر؛ ٥) جزء؛ ٦) پسوند بەمعنی ریزندە.

**ڕیز:** ١) سەف، بەپەنایەکەوە؛ ٢) وردیلە، بچکەلە **فا** ١) صف؛ ٢) ریز، خرد.

**ڕیزاڵ:** پارچەی باریك وەك ھەودا **فا** باریك نخ مانند.

**ڕیزاڵ ڕیزاڵ:** پارچەپارچەی باریکەلە **فا** پارەپارە، باریك.

**ڕێزاڵ ڕێزاڵ:** ڕیزاڵ ڕیزاڵ **فا** پارەپارە، باریك.

**ڕێزان:** ١) بەلەدی ڕێ، شارەزا؛ ٢) بریتی لە پیاوی کارزان و عالم؛ ٣) ناوی دوو گوندە **فا** ١) راەشناس؛ ٢) کنایە از دانشمند؛ ٣) نام دو آبادی.

**ڕێزانە:** بەخشش لەبەرانبەری کاری چاكدا، پاداشت **فا** انعام، پاداش.

**ڕیزای:** وەرین **فا** فروریزی.

**ڕێز بێوە گرتن:** یەك‌یەك بەھەموان ڕاگەیشتن **فا** یکی‌یکی بە همە رسیدن.

**ڕیزبێوە گرتن:** ڕێزبێوە گرتن **فا** یکی‌یکی بەھمە رسیدن.

**ڕێزك:** ١) ڕێوشوێن و قانون؛ ٢) دێڕە خەتی ورد **فا** ١) قانون؛ ٢) سطر ریز.

**ڕیزکردن:** لەتەنیشت یەکەوە دانان **فا** پهلوی هم قرار دادن.

**ڕێزکردن:** ڕیزکردن **فا** نگا: ڕیزکردن.

**ڕیزکین:** ڕسکین **فا** نگا: ڕسکین.

**ڕێزگال:** ڕیزاڵ **فا** نگا: ڕیزاڵ.

**ڕیزگرتن:** قەدرگرتن **فا** احترام گذاشتن.

**ڕێزگرتن:** ریزگرتن **فا** احترام گذاشتن.

**ڕێزلان:** ١) ڕیزاڵ؛ ٢) زۆر ورد **فا** ١) نگا: ڕیزاڵ؛ ٢) بسیار ریز.

**ڕێزلانە:** ١) ڕیزاڵ؛ ٢) زۆر ورد **فا** ١) نگا: ڕیزاڵ؛ ٢) بسیار ریز.

**ڕێزلێننە:** ١) ڕیزاڵ؛ ٢) زۆر ورد **فا** ١) نگا: ڕیزاڵ؛ ٢) بسیار ریز.

**ڕێزلێ گرتن:** ١) قەدرگرتن؛ ٢) بەھەمولایەك گەیشتن: (لەسەر خۆجوونە شەیدابوونە قوڕ پێوانە سووتانە / ھەتا مردن محەبەت ئیشی زۆرە ڕێزی لێ دەگرم) «مەحوی» **فا** ١) محترم شمردن؛ ٢) یك‌یك بە همە رسیدن.

**ڕیزلێ گرتن:** ڕێزلێ گرتن **فا** نگا: ڕێزلێ گرتن.

**ڕێزلێ نان:** ڕێزلێ گرتن **فا** نگا: ڕێزلێ گرتن.

**ڕێزمان:** دەستوری زمان **فا** دستور زبان.

**ڕیزنای:** وەراندن **فا** فروریزاندن.

**ڕێزوك:** جێگەی خوێدانی مالات و ئاژەڵ **فا** جای نمك پاشیدن برای دام.

**ڕێزوڵە:** ڕیزاڵ **فا** نگا: ڕیزاڵ.

**ڕیزوەم:** زەوینی جێ باغ **فا** زمین جای باغ.

**ڕیزە:** ١) کەموکە، پیچەك، ھندەكەك؛ ٢) بەرانبەری لە پایەدا: (کچم لە ڕیزەی کوڕی ئەودایە) **فا** ١) کمی از چیزی؛ ٢) برابری در شخصیت و ارزش.

**ڕیزەڕیزە:** ڕیزاڵ ڕیزاڵ **فا** پارەپارە، باریك.

**ڕیزەلانە:** ڕیزلانە، ڕیزاڵ **فا** نگا: ڕیزاڵ، ڕێزلانە.

**ڕیزەلۆك:** بەردێ کە بە توندگوشین ورد دەبێ **فا** سنگ نازك کە با دست می‌شکند.

**ڕیزەڵە:** ڕەزڵە **فا** تاج‌ریزی، گیاهی است.

**ڕیزەوپیزە:** خرت‌وپرت **فا** خرت و پرت.

**ڕیزەوڵ:** ورتکەنان بۆ تێ‌ولاندن، وردە نان بۆ تێکوشین **فا** ریزە نان برای تریت.

**ڕیزھەڤ:** ئەو وشانەی بە ڕواڵە یەك نین و بە مانا یەکن **فا** کلمات مترادف.

**ڕیزین:** ڕسکین **فا** نگا: ڕسکین.

**ڕێژ:** ١) پاشگری بەواتا: ڕژێن؛ ٢) نەخۆشی گولی **فا** ١) پسوند بەمعنی ریزندە؛ ٢) بیماری جذام.

**ڕێژاخ:** خۆڵەبان، گڵەبان **فا** خاك پشت‌بام.

**ڕێژاڤ:** ١) ڕەزاو؛ ٢) ماساو لەبەر ئاو خواردنەوە؛ ٣) تافگە **فا** ١) مصب؛ ٢) آماسیدە از آب خوردن زیاد؛ ٣) آبشار.

**ڕێژان:** ١) دابارین؛ ٢) ڕژان؛ ٣) ڕژانن؛ ٤) کل‌دەچاوکردن؛ ٥) بارەی زەوی **فا** ١) باریدن؛ ٢) ریختن؛ ٣) فروریزاندن؛ ٤) سرمە در چشم کشیدن؛ ٥) حاصل غلە.

**ڕێژاو:** ١) ڕێژاڤ؛ ٢) جۆرێ ھەنجیر؛ ٣) پەرێشان و بلاو **فا** ١) نگا: ڕێژاڤ؛ ٢) نوعی انجیر؛ ٣) پریشان و پراکندە.

**ڕێژبەر:** ڕەنجبەر **فا** کشاور زحمتکش مزدبگیر.

**ڕێژبێژ:** ناوی تایبەتی خواردنەوەو چێشت لێ نان و جل‌شۆرین **فا** آب ویژە استعمال کردن در خانە.

**ڕێژگاو:** ڕەنج بەخەسار **فا** کسی کە بیهودە در تلاش است.

**ڕێژگە:** ڕێزوك **فا** نگا: ڕێزوك.

**ڕێژنگ:** ڕەشاش **فا** مسلسل، تیربار.

**ڕێژنە:** ڕەژنە **فا** نگا: ڕەژنە.

**ڕێژوو:** خەڵووز، ڕەژی، ڕەژوو **فا** زغال.

**ڕێژە:** ١) بوتە، دریچە، قاڵبی داڕشتن؛ ٢) نەخۆشی گولی، پیسی؛ ٣) خاکی شوشە **فا** ١) قالب ریختەگری؛ ٢) جذام؛ ٣) سنگ شیشە.

**ڕێـژەن:** ١) بڕشتی خەلە؛ ٢) ڕێبڕ، چەتە **فا** ١) بهرە، غلە کاشتە؛ ٢) راهزن.

**ڕێژەو:** بڕشتی خەلە **فا** انتاج غلە کاشتە.

**ڕیس:** ١) خوری و لۆکەی بە تەشی و خەرەك بادراو؛ ٢) ئەستوراییی: (پام لەسەر ڕیسی ملی دانا) **فا** ١) ریسیدە، رشتە؛ ٢) قطر، ستبری.

**ڕێس:** ١) ڕیس؛ ٢) پاشگری بەواتا: کەسێ کە دەڕیسێ: (تەشی‌ڕێس) **فا** ١) نگا: ڕیس؛ ٢) پسوند بەمعنی ریسندە.

**ڕێسا:** ڕێوشوێنی عادەتی ف عرف و عادت.
**ڕیسپی:** ئیختیار، پیاوماقوڵی گوند ف کدخدا، ریش سفید.
**ڕیست:** ڕێسراو ف ریس.
**ڕێستن:** ڕستن ف نگا: ڕستن.
**ڕیسوا:** ئابڕونەماو، ناوزڕاو ف رسوا.
**ڕێسە:** ١) ڕیس؛ ٢) قسە درێژ کردنەوە ف ١) نگا: ڕیس؛ ٢) پرگویی.
**ڕیسی:** گزرە، گیای گێرەکراو ف پرس، گیاه کوبیده برای علوفه.
**ڕێسین:** ڕستن ف نگا: ڕستن.
**ڕیش:** ڕھ، ڕدێن، ڕندێن، ئەڕدێن ف موی زنخ، ریش.
**ڕێش:** ١) بریندار؛ ٢) برین ف ١) زخمی؛ ٢) زخم.
**ڕیشا:** کوانی حەستەم، دومەڵی پیس ف دُمَل خطرناك.
**ڕیشاڵ:** بزگوڕ، پارچەی باریك لە قوماش، ڕیزاڵ ف نگا: ڕیزاڵ، پارەهای باریك از قماش.
**ڕیشالۆك:** تەرخون، یەکێکە لە سەوزەجات ف گیاه ترخون.
**ڕیشاڵە:** ڕیشاڵ، بزگوڕ ف نگا: ڕیزاڵ، ڕیشاڵ.
**ڕێشـاندەر:** ١) کەسێ کە پیاو شارەزای ڕێ دەکا؛ ٢) نیشانەی ڕێگە بۆ شارەزایی ف ١) رهنمون؛ ٢) علامت راهنما.
**ڕیش بابا:** جۆرێ ترێ ف نوعی انگور.
**ڕیش باوا:** ڕیش بابا ف نگا: ڕیش بابا.
**ڕیش پان:** ڕندێن زل ف ریش پهن.
**ڕیش خەن:** گاڵتە پێ کردن، پێ پێکەنین ف ریشخند.
**ڕیشدار:** بەڕدێن، ڕدێن دار ف ریشو.
**ڕیش سپی:** ڕیسپی ف ریش سفید.
**ڕیشو:** بادراوی هەڵوەشاوی کەنارەی پارچە ف شنگلە، منگولە.
**ڕیشۆك:** ڕیشوُ ف منگولە.
**ڕیشۆڵ:** سێرو، ڕەشۆڵە، گاوانی ف پرندۀ سار.
**ڕیشۆڵە:** ١) ڕیشۆڵ؛ ٢) گلێکی گرموڵەکراوی سپی ڕەنگە ژنان خۆی پێ دەشۆن ف ١) سار؛ ٢) خاك روشورە.
**ڕیشوە:** ١) ڕیشو؛ ٢) ڕشفەت ف ١) منگولە؛ ٢) رشوە.
**ڕیشـە:** ١) ڕەگی دارو گیا؛ ٢) ڕیشـو ف ١) ریشـە، بیخ نبـاتـات؛ ٢) منگولە.
**ڕیشی:** ڕیشو ف منگولە.
**ریغ:** خیز، زیخ ف شن.
**ریف:** قاش، پارچەیەك لە میوەی بێستان ف قاچ.
**ریڤ:** ڕوُی، توُکەبەر ف موی زهار.
**ڕێڤاس:** نێرتکی باسکلاو ف ریواس.
**ڕیڤن:** پیس، چڵکن، گەمار ف کثیف.
**ڕێڤنگ:** ڕێبوار ف رهرو.
**ڕێڤنگی:** ڕێبوار ف رهرو.
**ریڤـۆك:** شەمە ترێلکە، جۆرێ زەرگەتەی درێژوکەیە هەنگوینی هەیە ف نوعی زنبور عسل زرد وحشی.
**ڕێڤەبرن:** جێ بەجێ کردن ف ادارە کردن.

**ڕێڤەکرن:** ڕێ کردنەوە ف راه باز کردن.
**ڕێڤـی:** ١) چتر، ڕوڤی؛ ٢) ڕیخۆڵە؛ ٣) ڕێبـوار ف ١) روبـاه؛ ٢) رودە؛ ٣) رهگذر.
**ڕێڤیك:** ڕۆخڵە، ڕیخۆڵە، ڕۆدی ف رودە.
**ڕێڤینگ:** ڕێبوار، ڕێبار ف رهگذار.
**ڕیق:** لە دەست نەرمی سیس هەڵاتو ف نرم پژمردە.
**ڕیقن:** لەڕو لاواز، تەواو بێ هێز ف لاغر مردنی.
**ڕیقنە:** ١) جیقنە، ریتق، ڕیخنە؛ ٢) ڕیقن ف ١) مدفوع پرندە، پیخال؛ ٢) لاغر مردنی.
**ڕیقنەسپیلکە:** جۆرێ نەخۆشی مەلی ماڵی ف از بیماریهای پرندگان خانگی.
**ڕیقۆ:** ڕیقن ف نگا: ڕیقن.
**ڕیقوفیق:** برێتی لە ڕیقن ف نگا: ڕیقن.
**ڕیقۆڵە:** ڕیقن، ڕەقەڵە ف نگا: ڕیقن.
**ڕێك:** ١) ڕێ، ڕا؛ ٢) بەرانبەر؛ ٣) زەوی تەخت؛ ٤) دروس، پێکهـاتو؛ ٥) ئاشنایەتـی؛ ٦) لەبارو تەرز؛ ٧) گش، هەمو ف ١) راه؛ ٢) برابر؛ ٣) هموار؛ ٤) درست؛ ٥) دوستی؛ ٦) منتظم و مرتّب؛ ٧) همه.
**ڕێکاتی:** تفاق، یەك بوُن، دۆستایەتی ف اتّفاق، دوستی.
**ڕێکانی:** ناوی هۆزێکە لە کوردستان ف نام عشیرتی در کردستان.
**ڕێکـایی:** ١) ئاشنایەتی، دۆستایەتی؛ ٢) تەختایی زەوین ف ١) اتّفاق، دوستی؛ ٢) همواری زمین.
**ڕێکبـوُن:** ١) بەرانبـەر هاتنـەوە؛ ٢) ئاشنـایەتی ف ١) همطراز شدن؛ ٢) دوستی.
**ڕێکخستن:** ١) دوُ شت بەیەکدا ساوین؛ ٢) دوُ دژ لێك ئاشت کردنەوە؛ ٣) تەکوزکردن ف ١) دو چیز بهم ساییدن؛ ٢) دشمنان را آشتی دادن؛ ٣) منظم و مرتب کردن.
**ڕێکـرن:** ١) بەڕێ کردن؛ ٢) ڕێ دان بۆ ڕۆیشتـن: (ڕێـم کە دەڕۆم) ف ١) روانە کردن؛ ٢) راەدادن.
**ڕێك کردن:** ١) تەخت کردنی زەوی؛ ٢) تەکوزکردن ف ١) هموار کردن زمین؛ ٢) مرتّب کردن.
**ڕێك کوشین:** بەتەوژم زۆر بۆ هەمولای کەسێ یان شتێ هێنان ف درهم فشردن.
**ڕێك کەفتن:** پێکهاتن ف اتّفاق، سازش.
**ڕێك کەوتن:** پێکهاتن ف اتّفاق، سازش.
**ڕیکۆ:** ریش درێژ ف ریش بلند.
**ڕێکوپێك:** لەبارو تەکوز ف مرتّب، منظّم.
**ڕێ کوُڕك:** ڕێگە یەك کە هەتا سەر نات با ف بن بست.
**ڕێکۆك:** ڕێچکە، باریکەڕێ ف راه کم‌عرض.
**ڕیکـە:** ١) جیرە؛ ٢) سیرەی ددان ف ١) صدای نوك قلم؛ ٢) صدای دندان بەهم ساییدن.
**ڕێك هاتن:** ١) گرژبـوُن و ترنجـان: (ئـەو قسەی بیست ڕێك هـات)؛ ٢) جێ بەجێ بوُن: (کـا[illegible] هات) ف ١) درهم شدن، بروز

ناراحتی در قیافهٔ کسی؛ ٢) درست شدن کار.

**ڕێك‌هاوردن:** پێك‌هێنانی کار، جێ‌بەجێ کردن [ف] درست کردن، فراهم آوردن، انجام دادن.

**ڕێکەوت:** بەهەڵکەوت [ف] اتّفاقی.

**ڕێکەوتن:** ١) کەوتنەڕێ بۆ سەفەر؛ ٢) ڕێك کەوتن؛ ٣) پێك‌هاتنی کار؛ ٤) ڕاونان، دواکەوتن بەغار [ف] ١) راهی شدن؛ ٢) توافق کردن؛ ٣) درست شدن کار؛ ٤) دنبال کردن بەدو.

**ڕێکەوتو:** ١) ڕێکەوت؛ ٢) بەڕێ کەوتو؛ ٣) پێکهاتگ [ف] ١) اتّفاقی؛ ٢) راه افتاده؛ ٣) درست شده.

**ڕێکی:** ١) بەرانبەری؛ ٢) دۆستایەتی؛ ٣) تەختایی [ف] ١) برابری؛ ٢) دوستی؛ ٣) همواری.

**ریگ:** تۆزێکی بەبریقەیە بۆ مەرەکەف لەقاقەزمژین [ف] گردی است خشك کن.

**ڕێگا:** ڕێ، ڕا، ڕێك [ف] راه.

**ڕێگاوبان:** ڕێ‌وبان [ف] راه عمومی.

**ڕێگاکردن:** ١) ڕێگادان بۆ ڕۆیشتن؛ ٢) ڕێ‌دروست کردن [ف] ١) راه دادن؛ ٢) راه‌سازی.

**ڕێگر:** ڕێبڕ، پیاوخراپ، چەتە، گۆران، ڕابڕ [ف] راهزن.

**ڕێگرتن:** ١) ڕێبڕی، چەتەیی؛ ٢) بوُنە لەمبەر لە سەر ڕێ [ف] ١) رهزنی؛ ٢) مانع سر راه شدن.

**ڕێگۆڕین:** بریتی لە وازهێنان لە بڕوای خۆی [ف] کنایه از تغییر مسیر دادن در مرام.

**ڕێگە:** ١) جیڕەی قەڵەم؛ ٢) سیڕەی ددان [ف] ١) صدای نوك قلم برکاغذ؛ ٢) صدای بەهم ساییدن دندانها.

**ڕێگە:** ١) ڕێ، ڕا، ڕێك؛ ٢) بریتی لە دۆز، ڕەوشت [ف] ١) راه؛ ٢) کنایه از مرام.

**ڕێگەخستن:** خستنەسەرڕێ، ڕەوانەکردن [ف] راه انداختن.

**ڕێگەوبان:** ڕێ‌وبان، ڕێگاوبان [ف] راه عمومی.

**ڕێگیر:** ڕێگر [ف] راهزن.

**ڕیل:** ژالە، لوُڕك، ڕوُلك، ڕوُل [ف] خر زهره.

**ڕێل:** ١) جەنگەڵ، دارستان، لێڕ، لێڕەوار؛ ٢) ئاونگ، شەونم [ف] ١) جنگل؛ ٢) شبنم.

**ڕێ‌لادان:** ڕێگۆڕین [ف] انحراف از راه.

**ڕیلاس:** ڕوُداماڵیاگ [ف] پر رو، گستاخ.

**ڕێ‌لەبەر چوُن:** بەخۆشی‌و ئاسودەیی سەفەر کردن [ف] آسوده سفر کردن.

**ڕێڵەخۆ:** ڕۆخلە، ڕیخوڵە، ڕۆدی، ڕیخەڵۆ، ڕیخەڵۆکە، ڕیخەڵۆك، ڕوُڤی [ف] روده.

**ڕێلی:** ١) میوەو بەری دارستان، بەری لێڕەوار؛ ٢) گێوژ، گۆیژ [ف] ١) میوهٔ جنگلی؛ ٢) زالزالك.

**ڕین:** ریان [ف] ریدن.

**ڕێن:** ١) ڕان، مێگەل، گاگەل؛ ٢) ئەڕدێن، ڕدێن، ڕیش [ف] ١) رمه، گله؛ ٢) ریش.

**ڕێنامە:** بەرنامە، پەیڕەو [ف] برنامه.

**ڕێنج:** ١) شوێن، ئاسەوار؛ ٢) ڕەنج؛ ٣) کرمی گیابڕ [ف] ١) اثر، رد؛ ٢) آزار، رنج؛ ٣) کرمی است آفت گوسفند و بز.

**ڕینجبەر:** ڕەنجبەر [ف] نگا: ڕەنجبەر.

**ڕێنجەبەر:** ڕەنجبەر [ف] نگا: ڕەنجبەر.

**رینك:** لەجەرو لاواز [ف] لاغرمردنی.

**ڕێنکە:** لێك تۆپەڵ بوُن‌و وێستان [ف] تجمّع کردن و نرفتن.

**ڕێنکەدان:** ڕێنکە [ف] نگا: ڕێنکە.

**ڕینگ:** ١) ڕنگ؛ ٢) خوری کە بەدەست لە پێستەی دەڕنئەوە [ف] ١) نگا: ڕنگ؛ ٢) پشمی که از پوست چینند.

**ڕینگاڵ:** ١) ڕنگاڵ، ڕنگ؛ ٢) شڕۆڵ، جل‌شڕ [ف] ١) نگا: ڕنگ؛ ٢) ژنده‌پوش.

**ڕینگانەوە:** ١) شیرەدانەوەی دۆشاو؛ ٢) ڕەواق؛ ٣) قسەی بێ‌تام [ف] ١) شیره پس دادن؛ ٢) شهد؛ ٣) وراّجی، ژاژخایی.

**ڕینگۆڵ:** بزگور، تیتوڵ [ف] وصله‌پاره.

**ڕینگە:** بوڵەبوڵ، پرتەپرت [ف] غرولند.

**ڕینگەڕینگ:** ڕینگەی زۆر [ف] غرولند زیاد.

**ڕێنما:** ڕێ‌شاندەر [ف] رهنما، رهنمون.

**ڕێنوُس:** دەستوُری نوُسین، ئیملا [ف] املاء.

**ڕێ‌نوێن:** ڕێ‌شاندەر [ف] راهنما.

**ڕێو:** ١) ڕوُی، توُکەبەر، موی بەرگەدە؛ ٢) تەڵەکەو فێڵ [ف] ١) موی زهار؛ ٢) حیله.

**ڕێوار:** ڕێبار، ڕێبوار، ڕێڤنگ، ڕێڤینگ [ف] رهگذار.

**ڕێواز:** ڕێباز [ف] راه عموم.

**ڕێواس:** نێرتکی باسکلاو [ف] ریواس.

**ڕێواسی:** مام‌ڕێواس، گیایەکی باڵابڵندی ترشە دژی کرمی ناوزگە [ف] گیاهی است داروی ضد کرم.

**ڕێوان:** ئاگاداری ڕێگە [ف] راهبان.

**ڕێواو:** ڕێواس [ف] ریواس.

**ڕێوبان:** ڕێگەوبان [ف] گذرگاه عمومی.

**ڕێوبوار:** ڕێبوار [ف] رهگذار.

**ڕێ‌وجێ:** ئاوەزپەسند، لەبار [ف] معقول، عقل‌پسند.

**ڕێوڕا:** ١) هەر گورج لە ڕێگەوە؛ ٢) ڕاستەڕێ [ف] ١) فوراً، از راه رسیده؛ ٢) به خط مستقیم.

**ڕێوڕاست:** ڕێوڕا [ف] نگا: ڕێوڕا.

**ڕێ‌وساندن:** تێراو کردن [ف] سیراب کردن.

**ڕێوشوێن:** ١) باوی ناو کۆمەڵ؛ ٢) دەستوری کار [ف] ١) عادات، تقالید؛ ٢) طرح.

**ریوُن:** ڕیحان [ف] ریحان.

**ڕیوە:** گای بەڵەك [ف] گاو ابلق.

**ڕیوەڕیو:** ١) پرتەپرت؛ ٢) زۆرگوتنی بێ‌تام [ف] ١) غرولند؛ ٢) ژاژخایی.

**ڕیوەڵ**: زەردەڵەی لاواز ف لاغر زردرنگ مردنی.
**ڕیوەڵە**: ڕیوەڵ ف نگا: ڕیوەڵ.
**ڕیوەن**: باسکڵاو، کڵاوبن، بنی ڕێواس ف راوند، بیخ ریواس.
**ڕیوی**: ڕوڤی، ڕێڤی ف روباه.
**ڕێـوی**: ١) ڕدێن، ئەڕدێن؛ ٢) ڕێڤـی، ڕوڤـی؛ ٣) ڕێبـوار ف ١) ریش؛ ٢) روباه؛ ٣) رهگذار.

**ڕێوی کرن**: ١) ڕژاندن؛ ٢) بەڕێ کردن ف ١) ریختن؛ ٢) راهی کردن.
**ڕێوینگ**: ١) ڕان، مێگەل؛ ٢) ڕێبوار ف ١) گله، رمه؛ ٢) رهگذار.
**ڕیه** : ڕدێن، ڕیش ف ریش.
**ڕیهتن**: ١) ڕژاندن؛ ٢) ڕژیان ف ١) ریزاندن؛ ٢) ریختن.
**ڕیەن**: ڕان، مێگەل، ڕێن ف رمه.
**ڕیهەڤ**: هاواڵ، هاودەم ف همدم، رفیق.

ز: ١) له، جه، ژ؛ ٢) پیتی بادانه‌وه ف ١) از؛ ٢) حرف عطف.

**زا:** ١) فرزه‌ند: (**کوڕه‌زا، ئامۆزا**)؛ ٢) بێچوی مه‌ڕو بزن: (**زاو** ماك تێکه‌ڵ کراوه)؛ ٣) زان، منال‌بوُن: (له زگ‌و **زا** که‌وتوه)؛ ۴) منالّی بو، بێچوی بو: (مه‌ڕه‌که **زا** به‌رخێکی بو)؛ ۵) تازه به‌دنیاهاتو: (ئه‌و به‌رخه دوێنێ **زا**)؛ ۶) که‌وایه، ده‌ی سا: (**زا** وه‌ره)؛ ٧) نۆبه له قومـاردا؛ ٨) وشك. زوها، زوا ف ١) فرزند؛ ٢) بچهٔ گوسفند و بز؛ ٣) زایش؛ ۴) زاد، زایید؛ ۵) تازه به‌دنیا آمده؛ ۶) پس، حالا که اینطور است؛ ٧) نوبت در قمار؛ ٨) خُشك.

**زاب:** سه‌کۆ، دکه ف سکو.

**زابت:** ئه‌فسه‌ر ف درجه‌دار، افسر.

**زابرن:** بردنه‌وه‌ی قومار ف برد در قمار.

**زابلۆق:** ڕۆخڵه‌ی ئه‌ستور ف رودهٔ کلفت.

**زابوت:** زابت، خاوه‌ن پله له سوپادا، ئه‌فسه‌ر ف افسر.

**زابوق:** سه‌رانگوێلك، گوُفك ف جای ریختن سرگین.

**زابۆق:** ئاودڕ، دادڕاوی لافاو ف درهٔ مسیل باران.

**زابه‌ند:** ده‌فته‌ری ناونوسینی تازه‌زاوان ف دفتر موالید.

**زاپ:** ١) لکی چۆم، لق له چه‌م؛ ٢) چه‌وی پان‌و لوُس‌و ناسك که منالّ گه‌مه‌ی پێ ده‌که‌ن، سواپ ف ١) نهر فرعی؛ ٢) شن صاف و نازك که بازیچهٔ کودکان است.

**زاپان:** گه‌مه به زاپ، سواپێن ف بازی با «زاپ».

**زاپێن:** زاپان ف بازی با «زاپ».

**زات:** ١) هه‌بوُن، هه‌یه‌تی: (**به زاتی خودا**)؛ ٢) وێران، نه‌ترسان: (**زات** ناکه‌م بچم) ف ١) وجود، ذات؛ ٢) شجاعت، جرأت.

**زات‌بردن:** ترساندن ف ترساندن.

**زات‌چوُن:** ته‌واو ترسان، تۆقین له ترسان ف زهره‌ترك شدن، وحشت کردن.

**زاتدار:** به‌زات، ئازا، نه‌ترس ف متهوّر، شجاع.

**زات‌کردن:** وێران، نه‌ترسان ف اقدام، نترسیدن.

**زاتۆره:** تۆره‌مه ف نوه و نبیره.

**زاته‌نه:** زه‌ڕینی که‌ر ف عرعرکشیدن.

**زاتیك:** جێژنێکی هه‌رمه‌نیانه ف از اعیاد ارمنیان.

**زاتیل:** نه‌وه‌چڕك، نه‌وه‌و نه‌تیجه ف نوه و نبیره.

**زاج:** ١) کاکۆڵی منالّ؛ ٢) زاخ ف ١) موی پیشانی بچه؛ ٢) زاج.

**زاجلانه‌ی:** ژانی ژن له مندالّ بوندا ف درد زایمان.

**زاجلانی:** هه‌وه‌ڵ ژانی ژن له سه‌روبه‌ندی زارۆ هاوردندا ف اولین درد زایمان.

**زاج‌وپه‌رچه‌م:** کاکۆڵ‌و موی ناوچاوانی منالّ ف کاکل و موی پیشانی بچه.

**زاخ:** ١) کـوُل، کویل، ئاغه‌ڵی ناو کێو؛ ٢) شه‌ب، زاج؛ ٣) گاشه‌به‌رد؛ ۴) دنه، هانه؛ ۵) ـه‌وهه‌ری تیخی خه‌نجه‌رو شمشێر؛ ۶) خه‌ت، هێڵ ف ١) زاغه؛ ٢) زاج؛ ٣) صخره؛ ۴) تحریك، تشجیع؛ ۵) پرند؛ ۶) خط.

**زاخان:** به‌رده‌لانی زۆر چه‌توُن ف سنگلاخ صعب‌العبور.

**زاخاو:** تاواوی زاخ که بۆ قایم‌کردنه‌وه‌ی شتی له‌ق به کار ده‌هێنرێ ف زکاب.

**زاخـاودان:** ١) قایم کردن به زاخ؛ ٢) برێتی له ته‌خت کردنی که‌یف: (**زاخاوی مێشکم دا**) ف ١) پیوند دادن با زکاب؛ ٢) کنایه از خوش گذشتن.

**زاخاودانه‌وه:** زاخاودان ف نگا: زاخاودان.

**زاخـدار:** ١) تیخی جه‌وهه‌ردار؛ ٢) برێتی له مرۆی به‌حونه‌ر ف ١) تیغ جوهردار؛ ٢) کنایه از هنرمند.

**زاخـڕ:** ١) سه‌ره‌ ـێری به‌رداوی؛ ٢) کـوُل، ئاغه‌ڵی له کێودا بڕاو ف ١) نشیب سنگلاخی؛ ٢) زاغه.

**زاخۆ:** ناوی مه‌ڵبه‌ندو شارێکه له کوردستان ف نام منطقه و شهری در کردستان.

**زاخوڕ:** ڕه‌هۆڵ ف نگا: ڕه‌هۆڵ.

**زاخۆر:** ۱) بەردەلانی رژدو بڵند؛ ۲) ئەشکەوت لە کێفدا ف ۱) صخره؛ ۲) غار.

**زاخـۆران:** ۱) هۆزێکـە لە کوردستـان؛ ۲) تالانو برۆ: (زاخـۆران باخۆرانە) ف ۱) عشیرتی در کردستان؛ ۲) غارت و چپاول.

**زاخۆری:** پارچەیەکی لە ئاوریشم ژنان دەیکەنە لەچك ف پارچهٔ ابریشمی.

**زاخۆن:** ئاخەڵەمەڕی لە کێو دابڕاو، کوُل، کویل، زاخ ف زاغه.

**زاخه:** زاخۆن ف زاغه.

**ژاخێ:** قشقەڵە، قەلەباچکە ف زاغچه.

**زاخێڕ:** زاخڕ ف نگا: زاخڕ.

**زاد:** ۱) توێشو؛ ۲) دەخڵو نان؛ ۳) منداڵپەیابوُن: (زادو وەڵەدیان زۆرە) ف ۱) توشه؛ ۲) غلّه و نان؛ ۳) تولید بچه.

**زاددان:** توێشودان ف توشەدان.

**زادووەڵەد:** کوڕو کچ زیادبوُن ف تولید و توالد.

**زادو وەڵەند:** زادووەڵەد ف تولید و توالد.

**زاده:** فرزەند، بێچوی بنیادەم: (نەجیبزادە) ف فرزند.

**زادەکان:** فرزەندان ف فرزندان.

**زار:** ۱) منـاڵ؛ ۲) دەم، دەف؛ ۳) دەرمـانی جانەوەرکوژ، ژەهر؛ ۴) کزو لاواز؛ ۵) پەرێشـان و لێقەومـاو؛ ۶) دەنـگـی گریان؛ ۷) مۆرەی تەختەنەرد؛ ۸) پاشگری بەواتا: جێگە، جاڕ؛ ۹) شێوەی زمان: (زاری کرمانجی)؛ ۱۰) توُکەبەر؛ ۱۱) چێندراو: (زەوی‌و زار)؛ ۱۲) زراو ف ۱) کودك؛ ۲) دهـان؛ ۳) سمّ؛ ۴) لاغر؛ ۵) پریشان‌حال؛ ۶) صدای گریه؛ ۷) مهـرهٔ نرد؛ ۸) پسـوند بەمعنی جای؛ ۹) لهجه؛ ۱۰) موی زهار؛ ۱۱) زراعت؛ ۱۲) زَهره، ترس.

**زارا:** ۱) ناوە بۆ ژن؛ ۲) کەو، ژەرەژ؛ ۳) نـاوی شارێکە لە کـوردستان ف ۱) نام زنانه؛ ۲) کبك؛ ۳) نام شهری در کردستان.

**زاراخن:** زارەوانە، دەمەلبێن ف نگا: زارەوانە.

**زارانج:** کەو، ژەرەژ ف کبك.

**زارانژ:** ژەرەژ، زارانج، کەو ف کبك.

**زاراو:** ۱) دەرمـانی تراوی جانـەوەرکوژ؛ ۲) میز، مێز، گمێز؛ ۳) شێوەی ئاخافتن؛ ۴) دەراوی دەم ف ۱) سمّ آبکی، زهـرابه؛ ۲) شاش، ادرار؛ ۳) لهجهٔ ویژه؛ ۴) شیوهٔ سخن گفتن.

**زاراوه:** ۱) شێوەی تایبەتی ئاخافتن؛ ۲) دەراوی دەم، زاراو ف ۱) لهجهٔ ویژه؛ ۲) شیوهٔ بیان.

**زاربەست:** ۱) دەمبەست؛ ۲) دەمبێن ف ۱) دهان‌بند؛ ۲) دهانەبند.

**زاربێن:** دەمبێن، زاربەست ف دهانەبند.

**زاربێنك:** ۱) زاربێن؛ ۲) زاربەست ف ۱) دهانەبند؛ ۲) پوزەبند.

**زارخۆش:** ۱) دەمخۆش، ئافەرین بۆ گوتەت؛ ۲) دەمو کاوێژ خۆش ف ۱) آفرین بر گفتارت؛ ۲) شیرین زبان.

**زارخەن:** خەندەی تاڵ، کەنین لە ناڕەحەتیان ف خندهٔ تلخ، زهرخند.

**زارخەنه:** زارخەن ف خندهٔ تلخ، زهرخند.

**زاردڕاو:** دەم دڕاو، دەمشڕ ف دهن‌لق.

**زارزار:** لاسار، پێداگر، گوێ نەدەر ف لجوج.

**زارزارك:** دەمەلاسکە ف ادا درآوردن.

**زارشڕ:** تێدانەوەستاو ف دهن‌لق.

**زارقه:** ۱) دەمەلاسکە؛ ۲) زمان دەرێنان بۆ گاڵتە پێکردن ف ۱) ادای کسی را درآوردن؛ ۲) زبان به تمسخر درآوردن.

**زارك:** دەمی هەمـوشت جگـە لە جانـەوەر: (زارکی مەشکـە، زارکی ئەشکەوت) ف دهانه.

**زارگا:** بەرگەدە، جێگەی توُکەبەر لێڕوان ف رویشگاه موی زهار.

**زارگۆتن:** ستران، گۆرانی، قام، لاوك ف ترانه، آواز.

**زارنەرم:** زمانلوُس، دەمتەڕ ف چرب‌زبان.

**زاروُ:** ۱) کرمێکـە بۆ خوێنی پیس لە لەش مژین دەکار دەهێنرێ، زەرو، زێلو؛ ۲) زارۆ، مناڵ ف ۱) زالو؛ ۲) کودك، بچه.

**زارۆ:** ۱) فرزەند؛ ۲) منالی چکۆڵە ف ۱) فرزند؛ ۲) کودك.

**زارۆتی:** رۆژگاری منالی، زارۆکی ف دوران کودکی.

**زاروزێچ:** ژنو منال، خێزان بەگشتی ف خانواده.

**زارۆك:** زارۆ ف نگا: زارۆ.

**زارۆکی:** زارۆتی، رۆژگاری منالی ف دوران کودکی.

**زارۆڵه:** زارۆ ف نگا: زارۆ.

**زاره:** ۱) گەنمەکوتاو؛ ۲) زاراو، کیسەی زەرداوی لای جەرگ؛ ۳) موی بەرگەدە، زار ف ۱) گندم نیم‌کوبیده؛ ۲) زهره؛ ۳) موی زهار.

**زارەترەك:** برێتی لە زۆرترساو، تۆقیو لە ترسان ف زهره‌ترك.

**زارەچوُن:** زارەترەك ف زهره‌ترك.

**زارەزار:** دەنگی گریان بێ بڕانەوە، زۆڕە زۆڕ ف صدای گریهٔ متّصل، زارزار.

**زارەگا:** ۱) جێگەی ڕوانی توُکەبەر، زارگا؛ ۲) گوڵێکە ف ۱) رویشگاه موی زهار؛ ۲) گل میمون.

**زارەمبێن:** دەمبێن، زاربێن ف دهانەبند.

**زارەوانـه:** تۆپـەڵە پەڕۆ یان دار کە دە دەمی دەفری ڕادەکەن ف گلولهٔ وصله یا چوب که دهانەبند می‌شود.

**زاری:** ۱) گریان‌و شیوەن؛ ۲) زارۆڵە، منال ف ۱) شیون؛ ۲) کودك، بچه.

**زاریان:** شین‌و شەپۆڕکردن، گریانی تازیەمانی ف شیون کردن.

**زارین:** گریانی بەدەنگی بەرز ف گریه با صدای بلند.

**زاز:** ۱) ئامرازی ژێداری موسیقی، ساز؛ ۲) نەوە ف ۱) ساز موسیقی؛ ۲) نوه.

**زازا:** ۱) مەڵبـەنـدێکـە لە کوردستـان؛ ۲) شێوە ئاخـافتنێکی نزیك بە پەهلەوی؛ ۳) نەوەو نەتەوە ف ۱) منطقه‌ای در کردستان؛ ۲) یکی از لهجه‌های کردی؛ [illegible]وه و نبیره.

**زازاکی:** ئاخافتن [illegible]شێوەی زازایی ف تکلم به شیوهٔ «زازا»

**زاغ:** خەتی خەتکیشـان، خەتی درێژ بۆ نێوانی مەبەست، کێڕ ف خط افقی و عمودی در خط‌کشی.

**زاغور:** زاخڕ، زاخێڕ ف نشیب سنگلاخی.

**زاغوُر:** خەتکێش، ئامرازی خەتدان ف خط‌کش.

**زاف:** پڕ، زۆر، گەلێك، زەحف، زیاد، زێدە ف بسیار.

**زاف‌بیایش:** زاف‌بوُن ف زیاد شدن.

**زافت:** ئەفسەر ف درجه‌دار، افسر ارتش.

**زافتر:** زۆرتر، پتر ف بیشتر.

**زاف‌راتایی:** زۆر کەم بوُنەوە ف بسیار کم شدن.

**زافران:** بەری گیایەکە ڕەنگ زەرد بۆ دەرمان‌و پلاو بەکار دێت ف زعفران.

**زافرانی:** بە ڕەنگی زافران ف زعفرانی رنگ.

**زافزاف:** فرەفرە، زۆر زیاد ف بسیار زیاد.

**زاف کەردش:** زیاد کردن، زێدەکرن ف زیاد کردن.

**زاف‌نەمەند:** کەم کردو، زۆر نەمان ف اندك شدن.

**زافەران:** ١) زافران؛ ٢) ناوی گوندێکە ف ١) زعفران؛ ٢) نام دهی است.

**زافەرانی:** زافرانی ف زعفرانی رنگ.

**زافەی:** فرەیی، زیادی، زێدەیی ف بسیاری، زیاده.

**زافی:** زافەی ف بسیاری، زیاده.

**زافێر:** زافتر، زۆرتر، زێدەتر ف بیشتر.

**زاڤ:** ١) ئەستێرەیەکی گەڕیدەیە؛ ٢) زۆر، فرە ف ١) ستارهٔ عطارد؛ ٢) زیاد.

**زاڤـا:** ١) مێردی کچ یان خوشـك؛ ٢) تازەمێرد ف ١) شوهـر دختر یا خواهر؛ ٢) داماد.

**زاڤابەندی:** ئەو شوەی لە ماڵی باوکی بوُك‌دا دەژی ف داماد سرخانه.

**زاڤانی:** شەوی چوُنی زاوا بوٚلای بوُك ف شب زفاف.

**زاڤدان:** مناڵدان ف زهدان، رحم.

**زاڤر:** ١) زات، وێران؛ ٢) زاره، کیسەی زراو ف ١) یارا؛ ٢) زهره.

**زاڤراتانی:** زافراتایی، زیاده لە کەمی دان ف نگا: زافراتایی.

**زاڤزاڤ:** زۆر زیاد، فرەفرە ف بسیار زیاد.

**زاڤ‌نێ‌مەند:** زۆری نەما، لە کەمایەتی‌دا ف اندك شدن.

**زاڤ‌وزیچ:** زاروزێچ ف نگا: زاروزێچ.

**زاڤ‌وزێچ:** زاروزێچ ف نگا: زاروزێچ.

**زاڤەی:** زافی، زەحفی، فرەیی ف زیادی.

**زاڤی:** زافی، زەحفی، فرەیی ف زیادی.

**زاڤێر:** ژنی ڕازی لە گانی مێرد ف زن خوشنود از جماع شوهر.

**زاق:** ١) قەلەڕەشە؛ ٢) دەنگی قەلەڕەشە؛ ٣) دەربەڕیو؛ ٤) کەوە، شینی کاڵ؛ ٥) دەنگی تیژی منداڵ؛ ٦) توٚقین لە ترسان ف ١) غراب، زاغ؛ ٢) صـدای غـراب؛ ٣) برجستـه؛ ٤) آبی روشـن؛ ٥) جیغ بچـه؛ ٦) زهره‌ترك شدن.

**زاق‌وزروُق:** چەقەو هەرای مناڵان ف همهمه و جنجال بچه‌ها.

**زاق‌وزوُق:** زاق‌وزروُق ف همهمه و جنجال بچه‌ها.

**زاق‌وزیق:** زاق‌وزروُق ف همهمه و جنجال بچه‌ها.

**زاقـه:** ١) دەنگی تیژی مناڵ، زاق؛ ٢) دەنگی گریانی مناڵ ف ١) جیغ کشیدن بچه؛ ٢) صدای گریهٔ بچه.

**زاك:** ١) لەتکـە دەنکـە قەیسی کە منـاڵ کایەی پێ دەکـەن؛ ٢) هەوەڵ دۆشراو لە زاو، ژەك، فرچك؛ ٣) قیژەی مناڵ ف ١) نیم هستهٔ زردالو که بازیچهٔ بچه‌ها است؛ ٢) آغوز؛ ٣) جیغ بچه.

**زاك‌وزوُك:** زاق‌وزروُق ف همهمه و جنجال بچه‌ها.

**زاك‌وزیك:** زاق‌وزروُق ف همهمه و جنجال بچه‌ها.

**زاکوُن:** یاساو قانوُن: (ئاغایەکی بەزاکوُن بو کەس نەی‌دەوێرا لە ڕێ لادا) ف قانون قاطع.

**زاکە:** جیوەجیوی بەچکەمەل ف جیك‌جیك جوجه.

**زاگ:** ١) لەدایك بوگ؛ ٢) مناڵ‌بون؛ ٣) ژەك، هەوەڵ دۆشراو لە زاو؛ ٤) شەب، زاخ ف ١) زاده؛ ٢) زادن؛ ٣) آغوز؛ ٤) زاج.

**زاگـرۆز:** ١) زنجیرەچیـایەك لە کوردستـانـدا؛ ٢) ناوە بۆ پیـاوان ف ١) سلسله جبال زاگرس؛ ٢) نام مردانه.

**زاگرۆس:** زاگرۆز ف نگا: زاگرۆز.

**زاگۆر:** پەیاغ، توخماخ ف چوبدست کلفت، چماق.

**زاگە:** ١) جێگـەی لە دایك‌بون؛ ٢) لەدایك بوە؛ ٣) بێچـوی دیوە؛ ٤) گەمەیەکی منالانە؛ ٥) منداڵدان ف ١) زادگاه؛ ٢) از مادر زاییده است؛ ٣) بچه آورده است؛ ٤) یکی از بازیهای بچه‌ها؛ ٥) زهدان.

**زاڵ:** ١) سەرکـەوتـو بەسـەر مەبەست‌دا یان بە سەر دوژمندا؛ ٢) زبڵ: (زبڵ‌و زاڵ)؛ ٣) ناوە بۆ پیاوان ف ١) چیره؛ ٢) آشغال؛ ٣) اسم مردانه.

**زاڵ‌بون:** سەرکەوتن بەسەر کاری سەختا ف چیره شدن.

**زاڵم:** دەست درێژکەر بۆ مافی ڕەوای خەڵك ف ستمگر، ظالم.

**زاڵمایەتی:** زالمـەتی ف ظلم.

**زالمکی:** نارەوا کاری ف ظلم.

**زالمەتی:** زالمایەتی ف ظلم.

**زالمەی:** زاڵم ف ظالم.

**زالمێنی:** زاڵمایەتی ف ظلم.

**زاڵنە:** پێوەندی لە زنجیر ف زنجیر پای‌بند.

**زالۆ:** کیسەی زەرداو، زاره ف زهره.

**زاڵو:** زارو، کرمی خوێن‌مژ ف زالو.

**زاله:** زارو ف زالو.

**زاڵە:** ١) دادو هاوار لە دەست کەسێ، گلەو داد: (هەمو کەس لە دەستی بەزاڵەیە)؛ ٢) کیسەی زەرداو، زاره، زراو ف ١) داد و گله؛ ٢) زهره.

**زالی:** زارو، زەرو، زاڵو، زاڵی ف زالو.

**زاڵـی:** ١) دەست ڕۆیشتـن، سەرکـــەوتـوُیی؛ ٢) زارو ف ١) چیرگی؛ ٢) زالو.

**زام:** ١) برین، ڕێش؛ ٢) مناڵم بو؛ ٣) لە دایك بوم ف ١) زخم؛ ٢) بچه آوردم؛ ٣) از مادر زادم.

**زاما:** زاڤا ف داماد.

**زامار:** ١) بریندار؛ ٢) منداڵدان ف ١) زخمی؛ ٢) زهدان.

**زامارکەفتن:** منداڵدان وەرگەڕان ف زهدان از جای در رفتن.

**زامایی:** زاوایەتی ف دامادی.

**زامت:** چڵکی برین، کێم، هەوا ف ریم، چرك زخم.

**زامدار:** بریندار ف زخمی.

**زامڕۆت:** بەردێکی کەسکی بەنرخە ف زمرد.

**زامڕۆتی:** بەرەنگی زامڕۆت ف زمردی.

**زامڕۆتین:** کەسك وەك رەنگی زامڕۆت ف زمردی.

**زامـڕۆس:** گیایەکی بۆن خۆشـەو بۆ بێنی دوکـەڵەکەی دەیسوتینن ف گیاهی است که مصرف بخور دارد، گیاەمر.

**زامق:** چەسپ، کەرستەی لکاندن ف چسب.

**زامق کەردە:** چەسپێنراو، لکێندریاگ ف چسبانیده شده.

**زامقی:** لکێن، پێوە نوسێن ف چسبناك.

**زامن:** دەستەبەر ف ضامن، کفیل.

**زامـەت:** ۱) زامت؛ ۲) پیچ، کەم، هنـدك؛ ۳) ئەرکی گران، زەحمەت؛ ۴) دەردی ئەوین ف ۱) چرك زخم؛ ۲) اندك؛ ۳) مشقّت؛ ۴) رنج عاشقی.

**زان:** ۱) منـاڵ هێنان، بێچودیتن؛ ۲) لەدایك بون؛ ۳) پاشگری بەواتا: ئاگادار: (پیاوێکی زۆرزان بو، سیاسـەت **زانە**)؛ ۴) زەرەر: (ئەم سەگە زانـە خرۆیە)؛ ۵) زوان ف ۱) زایش؛ ۲) زادن از مادر؛ ۳) پـسـونـد بەمعنی داننده؛ ۴) زیان؛ ۵) زبان.

**زانا:** ۱) دانا، شتزان؛ ۲) ئاگادار ف ۱) دانا؛ ۲) آگاه.

**زاناڤ:** لە بیچمدا تەواو وەکو یەکتر ف شبیه.

**زانـام:** ۱) تێ گەیشتـم؛ ۲) خەبـەرم وەرگرت، زانیم؛ ۳) ئاگادارم ف ۱) فهمیدم؛ ۲) خبر یافتم؛ ۳) دانا هستم.

**زاناندن:** تێ گەیاندن ف فهمانیدن.

**زاناهی:** دانایی، ئاگاداری ف دانایی.

**زانایش:** زانست، ئاگاداری، لێ زانین ف دانش.

**زانایۆخ:** زۆر زانا، فریەزان ف علامه.

**زانایۆخی:** فرەزانی، مەعلانی. بۆ ژن دەڵێن ف دانشمندی.

**زانایەنە:** زاناهی ف دانش.

**زانایی:** زاناهی ف دانایی.

**زاند:** مناڵ هێنان، زارۆ پەیابوُن ف زائیدن.

**زاندۆر:** ئەشکەوتی سەهۆڵخانە ف یخچال طبیعی.

**زاندە گونایش:** لاڵەپەتە، تور ف الکن.

**زانس:** زاناهی، زانایی ف دانایی، علم.

**زانست:** ۱) زانایی، عیلم؛ ۲) تێ گەیشت ف ۱) علم؛ ۲) فهمید.

**زانستان:** فێرگەی بەرز ف آموزشگاه عالی.

**زانستگا:** جێگەی خوێندنی بەرز ف دانشگاه.

**زانستگە:** زانستگا ف دانشگاه.

**زانستم:** تێگەیشتم ف دانستم.

**زانستی:** ۱) زانایی؛ ۲) تێ گەیشتی ف ۱) علمی؛ ۲) فهمید ی.

**زانْق:** چەسپ، زامق ف چسب.

**زانْق کەردش:** زامق کەردە ف چسبانیده شده.

**زانقلە:** زەنگەتە، تلیسك ف تلسك.

**زانقۆڵە:** زانقلە ف تلسك.

**زانقی:** نوسەکی، کەرستەی لکاندن ف چسب.

**زانْك:** زوانە چکۆڵە، ئەلنگە ف زبان کوچك.

**زانکۆ:** جێ کۆبونەوەی زانایان ف مجمع دانشمندان.

**زانگە:** جێگەی مناڵبون ف زایشگاه.

**زانو:** ئانیشکە ف خم شدهٔ لوله بخاری، زانویی.

**زانۆ:** ئەژنۆ، زرانی ف زانو.

**زانەخرۆ:** سەگ یان ماڵاتێك کە زیان بە هاوسایان دەگەیەنێ ف سگ یا دام زیانرسان.

**زانەڤان:** پسپۆڕ، لەکار زان ف کارآمد.

**زانەوە:** ۱) ئاودەرچون لە وشکانی: (تەندورەکەمان **زاوەتەوە**)؛ ۲) ئاو لە کوێرەکانی هەڵقوڵینەوە: (کوێرەکانی **دەزێنەوە**) ف ۱) تراوش آب از خشکی؛ ۲) جوشیدن چشمهٔ زاینده.

**زانەیش:** پێ زانین، ئاگەدار بوُن ف آگاهی یافتن.

**زانی:** ۱) ئانیشکە؛ ۲) تێ گەیشت؛ ۳) زرانی، ئەژنۆ؛ ۴) ئارام، هێمن؛ ۵) تواشـاکـە؛ ۶) ناشێ، نابێت؛ ۷) دەزانی؛ ۸) زانیوتە ف ۱) خم شدهٔ لولـە؛ ۲) فهمید؛ ۳) زانـو؛ ۴) آرام؛ ۵) نگـاەکن؛ ۶) نمی‌شود؛ ۷) می‌دانی؛ ۸) دانسته‌ای.

**زانیار:** دانا، زانا ف عالم.

**زانیاری:** زانست ف علم.

**زانیایش:** پێزانین، ئاگەدار بوُن ف آگاهی یافتن.

**زانیم:** ۱) تێ گەیشتم؛ ۲) ئەژنوم ف ۱) فهمیدم، دانستم؛ ۲) زانویم.

**زانین گە:** بەشێکی تایبەتی لە زانستگە ف کالج.

**زاو:** ۱) مێوینـەی کە بەچـکـەی بوە؛ ۲) لەدایـكبوگ ف ۱) زاییـدە؛ ۲) متولد شده.

**زاوا:** زاڤا ف داماد.

**زاوابەندی:** زاڤابەندی ف نگا: زاڤابەندی.

**زاور:** ۱) تاقەت، زاڤر، زراو، وێـران؛ ۲) مناڵ، بێچـو ف ۱) یارا، زهرە؛ ۲) بچە.

**زاوران:** مێوینە لە دەمی مناڵبوندا، زەیستان ف [illegible]ر در حال زایمان، زائو.

**زاورچون:** ۱) زارەچون؛ ۲) بێچومردن ف ۱) زهرەترك شدن؛ ۲) بچە مردن.

**زاوزو:** بێچو بەدنیا هێنانی زۆر ف موالید زیاد.

**زاوزۆ:** زاوزو ف مولید زیاد.

**زاوزوە:** زاوزو ف موالید زیاد.

**زاوزێ:** زاوزو ف موالید زیاد.

**زاوق:** جیوە ف جیوه.

**زاوڵە:** زارۆ، زارۆك ف کودك، بچە.

**زاوما:** مەڕو بەرخ و بزن و کارێلەی تێکەڵاو ف برە و بزغالە همراە مادران.

**زاوماك:** زاوما ف نگا: زاوما.

**زاوە:** ۱) ئەستێرەیەکە؛ ۲) مناڵی بوە؛ ۲) لە دایك بوە ف ۱) تیر، عطارد؛

۲) بچه آورده؛ ۳) متولد شده است.
**زاوەرە:** ۱) زارۆ، زارۆڵە؛ ۲) زاڤر ف ۱) بچه؛ ۲) یارا، شهامت.
**زاویتە:** ۱) بای ساردی ڕۆژەلات؛ ۲) ناوی دۆلێك و گوندێكە ف ۱) باد سرد شرقی؛ ۲) نام دره و دهی است.
**زاوێر:** ڕەحەت بونی ژن لە گان، زاڤێر ف نگا: زاڤێر.
**زاهیر:** بەرچاو، دیار، ئاشكرا ف ظاهر.
**زای:** ۱) زاخ، شەب؛ ۲) مشتومال؛ ۳) منالت بوُ؛ ۴) لە دایك بوی ف ۱) زاج؛ ۲) صیقل؛ ۳) بچه آوردی؛ ۴) از مادرزادی.
**زایا:** ۱) تۆرەمە، وەچە، بەرە؛ ۲) ژنێ كە زۆر زگ‌وزا دەكات ف ۱) نگا: تۆرەمە؛ ۲) زنی كه زیاد می‌زاید.
**زایانـــدن:** یاری‌كردنی دایك لە زان‌دا ف كمـك كردن مادر در زاییدن، مامایی كردن.
**زای‌باتی‌زای:** نەوەی برای باوك، نەوەی مام ف نوهٔ عمو.
**زای‌برازازای:** نەوەی برا ف نوهٔ برادر.
**زای‌خالی‌زای:** خاڵوزازا، نەوەی برای دایك ف نوهٔ دایی.
**زایش:** زان، بێچو هێنان ف زائیدن.
**زای‌عەم‌زای:** نەوەی خوشكی باوك ف نوهٔ عمه.
**زایف:** لاواز، كەنەفت، كز، لەڕ ف لاغر مردنی.
**زایڵە:** دەنگی شیوەن‌و گریان ف صدای گریه و شیون.
**زاین:** ۱) بێچوهێنان؛ ۲) لەدایك بون ف ۱) بچه آوردن؛ ۲) متولد شدن.
**زاینگە:** زانگە، ئەو شوێنەی منالی تێدا دێتە دنیا ف زادگاه.
**زای‌وارزای:** نەوەی خوشك، خوشكەزازا ف نوهٔ خواهر.
**زایە:** ۱) پیزە، تۆل؛ ۲) منالی بوە؛ ۳) لە دایك بوە؛ ۴) لە كار كەوتو؛ ۵) برێتی لە مردو: (پیاوێكی لە دەستی زایە بوە)؛ ۶) گوم، ون، وندا؛ ۷) وەچە، تۆرەمە ف ۱) جنین؛ ۲) بچه آورده؛ ۳) متولّد شده؛ ۴) از كار افتاده؛ ۵) كنایه از مرده، ضایع، تلف؛ ۶) گم، ناپیدا؛ ۷) نگا: تۆرەمە.
**زایەڵە:** ۱) زایڵە؛ ۲) دەنگ دانەوە ف ۱) نگا: زایڵە؛ ۲) انعكاس صدا.
**زایەنــە:** زاین، زان. *بۆ ئاژەڵی دەكـار دێنن* ف زائید[illegible] *مورد حیوان استعمال می‌شود.*
**زای‌یا یك زای:** نەوەی خوشكی دایك ف نوهٔ خاله.
**زایی:** زاو ف نگا: زاو.
**زایێ:** ژنێ كە زۆر زگ‌وزا دەكا ف زنی كه زیاد می‌زاید.
**زایین:** زان، زاین ف زائیدن.
**زبارە:** ئاریكاری كۆمەڵ لە كاردا، هەرەوەز ف كار تعاونی گروهی.
**زبان:** ۱) پلەگۆشتی سوروپانی بزۆز لە ناو دەمدا؛ ۲) جۆری ئاخافتنی خەڵك ف ۱) زبان درون دهان؛ ۲) زبان مكالمه، لغت.
**زبر:** درشت لە دەست، دژی نەرم‌و لوس، زوُر ف خشن، زبر.
**زبران:** كێڵگەی بەكلۆو بەردەلان ف زمین زبر و سنگلاخی.
**زبرە:** ۱) درشتەی ساوارو گەنمەكوتاو؛ ۲) درشتەی لەهێڵەگ دراو، كەپەك ف ۱) دانه‌های درشت بلغور و گندم كوبیده؛ ۲) نخاله.
**زبڵ:** ۱) شتی گەسك‌دراوی ماڵ؛ ۲) پەین‌وپاڵ ف ۱) آشغال؛ ۲) فضلهٔ دام.
**زبڵچی:** كەسێ كە زبڵ فڕێ دەدا ف آشغالی.
**زبڵدان:** جێگەی لێ‌ڕشتن یان تێ ڕشتنی زبڵ ف آشغالدانی.
**زبڵ‌ڕێژ:** زبڵچی ف آشغالی.
**زبلگە:** جێگەی زبل لێ رژتن ف زباله‌دان.
**زبۆ:** سوكەڵەناوی زبێر، ناوی پیاوانە ف مخفف زبیر، اسم مردانه.
**زبە:** سوكەڵە ناوی زبێد، ناوی ژنانە ف مخفف زبیده، اسم زنانه.
**زبێ:** زبە ف نگا: زبە.
**زبیل:** پیسایی‌و پڕوپوشێ كە لە ماڵ وەدەر دەندرێ، زبڵ ف آشغال.
**زپ:** تژە ف مالامال.
**زپرك:** زیپكە ف جوش‌پوست.
**زپركە:** كوانی زۆروردیلە لەسەر پێست، زیپكە ف جوش پوست.
**زپك:** زپركە ف جوش پوست.
**زپەڕ:** لە سەرپەڕ، لای پێش یان دوایی ڕیز ف اول یا آخر صف.
**زت:** ۱) ڕاست، بێ خواری‌و لاری، ڕەپ؛ ۲) باوخۆش. لەپێش لە كارو كایەدا؛ ۳) دژ؛ ۴) گەمەیەكە بە وردە بەرد ئەكرێ؛ ۵) ڕوُت و قوُت ف ۱) راست برخـاسته؛ ۲) بالادست؛ ۳) ضدّ؛ ۴) نوعی بازی با شن؛ ۵) لخت و عریان.
**زت كەردش:** ڕوُتی كردو هەرچی بوُی بردی ف هەرچه داشت برد.
**زتم:** داخستنی دەرگاو پەنجەرەو... ف بستن در و پنجره و....
**زتمی:** داخراو، بەستراو ف بسته، مقابل باز.
**زج:** دژ ف ضد.
**زچ:** جانەوەرێكە بە ئاژەڵەوە دەنوُسێ ڕەنگی سوُرە، قوڕنو ف جانوری كه به دام می‌چسبد.
**زخ:** ڕەلم، قوم، ڕەمل ف شن و ماسه.
**زخت:** نەقیزە ف سیخونك.
**زخدان:** جێگەی قوُمی فرە ف شنزار.
**زخرە:** تفاقی ساڵ، زەخیرە، ئازوقە ف آذوقه.
**زخور:** چەو، وردكە بەرد ف سنگریزه.
**زدێ:** هێز، توانا، تاقەت ف توان.
**زڕ:** ۱) دژی بچـوك، زل، گەپ؛ ۲) گوشاد، هەراو؛ ۳) ناعەسڵ، بەدەڵ: (زڕدایـك، زڕبرا)؛ ۴) داری بەر كە بەر نەهێنـێ؛ ۵) وشك، برینگ؛ ۶) خۆهەڵكێشانی بەدرۆ: (ئەو قسانە زڕن)؛ ۷) دەنگی كەر؛ ۸) تڕ؛ ۹) لاسـار ف ۱) گُنـده، بزرگ جثّـه؛ ۲) فراخ؛ ۳) بدل؛ ۴) درخت بار نیاورده؛ ۵) خشـك؛ ۶) لاف بیهـوده؛ ۷) عرعر الاغ؛ ۸) باد مقعد، گوز؛ ۹) لج.
**زڕئـاپ:** ۱) زڕمـام، زڕبـرای باوك؛ ۲) برای باوەپیارە؛ ۳) شێت ف ۱) ناعمویی؛ ۲) برادر پدرخوانده؛ ۳) دیوانه.
**زرار:** خوسار، زیان، زەرەر، زەرەد ف زیان.
**زراری:** ۱) قۆپچە، دوگمە، قوبیە؛ ۲) هوزێكی كوردە لە كوردستان ف ۱) دگمه؛ ۲) عشیره‌ای كرد در كردستان.
**زرازڕ:** گۆرانی گوتنی كەر ف عرعر.
**زراف:** باریك ف باریك.

**زراڤك:** زراو، کیسەی زەرداو ف کیسهٔ زهره.

**زراڤیك:** زۆرباریك ف بسیار نازك.

**زراق:** گزینگی هەتاو، هەوەڵ شەوقی خۆر کاتی بەیانی ف اولین تابش آفتاب صبح.

**زڕان:** ١) بەخراپ دەرچون: (ناوزڕان، ناوی زڕاوە)؛ ٢) بڵاوبونی نهێنی: ٣) خەو پەڕین: ۴) تازە لك دەرکردنی دار ف ١) بد بر سر زبانها افتادن؛ ٢) فاش شدن راز؛ ٣) پریدن خواب؛ ۴) تازه جوانه دادن درخت.

**زڕاندن:** ١) درکاندنی نهێنی؛ ٢) خەوپەڕاندن ف ١) افشاکردن؛ ٢) خواب پراندن.

**زڕانەوە:** دەنگ دانەوەی وێك کەوتنی کانزا ف صدای بهم خوردن فلزّات.

**زرانی:** زانۆ، ئەژنۆ ف زانو.

**زراو:** ١) زارە، کیسەی زەرداو؛ ٢) زافر، توانای بەرانبەری، وێران ف ١) زهره؛ ٢) یارا، شجاعت.

**زڕاو:** ١) ناوی بەخراپ زڕیشتگ؛ ٢) خەوی پەڕیو؛ ٣) تازە لکدەرکردگ ف ١) نامِ بد در رفته؛ ٢) خوابِ بریده؛ ٣) تازه جوانه داده.

**زراوبردن:** ترساندن ف زهره ترك کردن.

**زراوبردو:** بریتی لە زۆر ترساو ف زهره ترك شده.

**زراوتۆقین:** زارەچون ف زهره ترك شدن.

**زراوچون:** زراوتۆقین، زارەچون ف زهره ترك شدن.

**زراونەمان:** زراوتۆقین، زراوچون ف زهره ترك شدن.

**زڕایش:** ١) زەڕەزەڕ کردن؛ ٢) زەنازەناو چەقەو کوڕە ف ١) عَرعَر کردن؛ ٢) شلوغ کردن.

**زرایەنە:** زڕایش ف نگا: زڕایش.

**زرب:** زبر ف زبر.

**زڕباب:** باوەپیارە، شوی دایك ف ناپدری.

**زڕبان:** زبران ف نگا: زبران.

**زڕباو:** زڕباب، باوەپیارە ف ناپدری.

**زڕباوك:** زڕباب، باوەپیارە ف ناپدری.

**زڕبرا:** برا هەر لە باوك یان هەر لە دایك ف برادر ناتنی.

**زرپ:** ١) قەبە، زەلام؛ ٢) زبر ف ١) گُنده؛ ٢) خشن.

**زڕپك:** زیك ف جوش پوست.

**زڕپەنگ:** زەڕەپنگ، جۆرێ پنگەزۆر بڵنددەبێ و ناشخورێ ف گیاه بدل پونه.

**زرت:** ١) تماشای بێ چاولێکدان؛ ٢) تەژەی گۆشتن ف ١) نگاه خیره؛ ٢) لندهور.

**زڕت:** ١) زل، گەپ، زەلام؛ ٢) خۆهەڵکێشانی بەدرۆ؛ ٣) تڕدان بە دەم؛ ۴) هەرەشە، گەف ف ١) گنده؛ ٢) لاف؛ ٣) شیشکی؛ ۴) تهدید.

**زڕتدان:** ١) خۆ هەڵکێشان بە درۆ؛ ٢) قسەی بێ تام کردن ف ١) تکبر کردن به دروغ؛ ٢) سخن بی‌مزه گفتن.

**زڕتك:** ١) زەلامی بێ ئاوەز؛ ٢) خۆهەلکێش؛ ٣) کونی قوُن ف ١) لندهور؛ ٢) متکبر؛ ٣) سوراخ مقعد، پیزی.

**زڕتلی:** شەشە، ئەوی شەش قامکی هەیە ف کسی که شش انگشت در یك دست دارد.

**زڕتۆ:** تەژەی خوێنتال ف تنومند بدقواره.

**زڕتۆك:** خۆهەڵکێش ف لافزن.

**زڕتۆڵ:** تیتۆڵ، بزگوڕ ف لتهٔ کهنه.

**زرته:** زرت ف نگا: زرت.

**زرتەبۆز:** ١) پیری تەژەی خوێنتال؛ ٢) کەلحۆ، زەلامی ناقۆڵا ف ١) پیر گندهٔ بدقواره؛ ٢) لندهور.

**زرتەزرت:** تماشای خێراخێراو بێ چاوتروکاندن ف خیره‌خیره نگاه کردن.

**زڕتەزڕت:** وەرامی کەسێ کە قسەی زۆر بێتام دەکا ف جواب خودستای ژاژخا.

**زرتەزەلام:** زلحورت ف لندهور.

**زڕتەك:** خۆهەڵکێشی بێ تام ف خودستای دروغ‌باف.

**زڕتی:** خوێڕیو بێکارە ف هرزه و هیچکاره.

**زڕجان:** ١) بەدرۆخۆهەڵکێش؛ ٢) جنێو فرۆش ف ١) لافزن؛ ٢) فحّاش.

**زرجك:** گیایەکە ف گیاهی است.

**زرچ:** ١) جیقنەی مەل؛ ٢) چەکەرەی تازە دەرهاتگ ف ١) چلغوز؛ ٢) جوانهٔ تازه.

**زڕچایش:** نەڕاندن، گوڕەوهەرا کردن ف داد زدن.

**زڕچایەنە:** زڕچایش ف نگا: زڕچایش.

**زرچك:** جوتە، لوشکە، لەقەی کەر ف جفتك.

**زڕچونە:** بێ نرخ، نەهێژا ف بی‌ارزش.

**زرخ:** زرێ، کراسی ئاسنی شەڕکەران ف زره.

**زڕخوسسی:** زڕخەسوُ، زڕدایکی هاوسەر ف نامادری همسر.

**زڕخوشك:** خوشکی هەر لەباب یان هەر لەدایك ف خواهر ناتنی.

**زڕخوەه:** زڕخوشك ف خواهر ناتنی.

**زڕخوێنك:** زڕخوشك ف خواهر ناتنی.

**زڕخەزوُر:** زڕبابی ژن یان مێرد ف بدرخواندهٔ همسر.

**زڕخەسو:** زڕدایکی بوك یان زڕدایکی مێرد ف نامادری زن یا شوهر.

**زڕداك:** باوەژن ف نامادری.

**زڕدایك:** زڕداك ف نامادری.

**زڕدەلو:** نێرینەی مرۆڤی شێتو دەبەنگ ف مرد دیوانهٔ خول.

**زڕدەلوێ:** مێوینەی شێتو دەبەنگ ف زن دیوانهٔ خول.

**زڕدەلی:** زڕدەلو ف نگا: زڕدەلو.

**زڕڕەك:** هەقمەق، نەزان، نەفام ف احمق، کم فهم.

**زرز:** زیز، زوُیر، قەڵس ف عصبانی.

**زڕزڕ:** دەنگی گریانی زبرو بەقەوەت ف صدای گریهٔ ناهنجار.

**زڕزڕە:** خڕخاشە، خشخشە ف خشخشه اسباب‌بازی.

**زڕزۆپ:** بێ ئابڕوُ، بێ شەرم ف بی حیا.

**زرزی:** توڕەیی ف عصبانیّت.
**زڕفستق:** بادامەزەمینە ف بادام زمینی.
**زڕقتك:** جانەوەریّکی چکۆلەی چزوداره پێوه دەدا، زەرگەتە، زەردەواڵە ف زنبور زرد خرد، موسه.
**زڕقتکی:** زڕقتك ف نگا: زڕقتك.
**زڕقتی:** زڕقتك ف نگا: زڕقتك.
**زرك:** ۱) بەهۆش، چوست، چالاك؛ ۲) تاسۆکە ف ۱) چالاك؛ ۲) طاس مسین.
**زڕك:** حەنجوڕ، خرچە، گندۆرەی کاڵ، قەرە خرچە ف خربزهٔ نارسیده.
**زرکان:** ناوی هۆزێکی کوردە ف نام طایفه‌ای از کُردها.
**زڕکتك:** ۱) زڕقتك؛ ۲) باڵدارێکی زەردی چکۆلەیە لە قەناری دەکا ف ۱) نگا: زڕقتك؛ ۲) پرنده‌ای زرد که به قناری شبیه است.
**زڕکچ:** کچی مێرد بۆ باوەژن یان کچی ژن بۆ باوە پیارە ف دخترخوانده، نادختری.
**زڕکۆ:** گیای گێرەکراو، گزرە ف گیاه کوبیده، پرس.
**زڕکوڕ:** کوڕی ژن بۆ زڕباب یان کوڕی پیاو بۆ زڕداك ف پسرخوانده، ناپسری.
**زرکوزینگ:** وریاو چالاك، چوستو مەزبوُت ف چست و چالاك.
**زڕکە:** خرچە ف خربزهٔ کال.
**زڕکەتاڵ:** گوژاڵك، کاڵەکەمارانە ف هندوانهٔ ابوجهل.
**زرکەتی:** زرینگانەوە، دەنگی کەوتنی کانزا ف صدای افتادن جسم فلزی.
**زڕکەچ:** کچ حەلی، زڕکچ ف نگا: زڕکچ.
**زڕکێتك:** ۱) زڕقتك؛ ۲) زڕکتك ف نگا: ۱) زڕقتك؛ ۲) زڕکتك.
**زڕگوێز:** ۱) دارێکە لە گوێز دەکاو بەر ناهێنێ؛ ۲) گوندێکە لە کوردستان ف ۱) درختی گردوسان بی‌ثمر؛ ۲) نام روستایی در کردستان.
**زڕگویزەڵە:** گوندێکی کوردە بەعسی ویرانیان کرد ف نام روستایی در کردستان.
**زرگـەزوك:** ۱) گەزگەزك؛ ۲) ناوی گوندێکە لە کوردستان ف ۱) گیاه گزنه؛ ۲) نام روستایی در کردستان.
**زڕگێزەر:** گیایەکی دەشتە بنەکەی لە گێزەر دەکا ف گیاهی است شبیه هویج.
**زڕگێژنۆك:** گیایەکە جانەوەر بیخوا پێ دەمرێ ف گیاه شوکران.
**زرم:** دەنگی کەوتنی شتی نەرمو گران ف صدای افتادن جسم سنگین نرم.
**زڕماك:** زڕداك، باوەژن، زردایك ف نامادری.
**زڕمام:** بروانەبو: زڕتاپ ف نگا: زڕتاپ.
**زرموکوت:** زرمی زۆر ف تراپو تروپ.
**زرمە:** زرم ف نگا: زرم.
**زرمـەزلێ:** هەڵبـەزینو مل دەبـەریەك نان بۆ گاڵتە ف گلاویزشدن و پایکوبی به‌قصد شوخی.
**زرمەزلیتانێ:** زرمەزلێ ف نگا: زرمەزلێ.
**زرمەزلیتە:** زرمەزلێ ف نگا: زرمەزلێ.
**زڕنا:** ئامرازێکی مۆسیقایە فوی پێدا دەکرێ، زوڕنا ف سرنا.
**زڕنای:** لەخەو ڕاپەڕین ف پریدن از خواب.
**زرنـگ:** ۱) زرك، وریا، وشیار، مەزبـوُت؛ ۲) دەنگـی مسو زێڕو زێو؛ ۳) ڕۆنی تاواوە، ڕۆنی زەنـگ ف ۱) زرنـگ؛ ۲) صدای مس و طلا و نقره؛ ۳) روغن تفیده.
**زرنگان:** ۱) دەنگ دانەوەی مسو زێڕو زێو؛ ۲) برێتی لە بێ‌قەدربون ف ۱) صدا دادن مس و طلا و نقره، درنگ؛ ۲) کنایه از بی‌احترام شدن.
**زرنگـانەوە:** ۱) دەنگ دانەوەی مسو زێڕو زێو؛ ۲) درەنگ بوُن کە بۆ شەو دەگوترێ: (شەو زرنگایەوە با بنوین)؛ ۳) دەنگ لە گوێ هاتن: (گوێم زرنگایەوە)؛ ۴) پندر بوُنەوە؛ ۵) دو جار لە کڵدا سوربوُنەوە ف ۱) صدا دادن فلـزات؛ ۲) درنگی ویژهٔ شـب؛ ۳) رنگ زدن گوش؛ ۴) نیم خشك شدهٔ تر؛ ۵) دوباره در کوره سرخ شدن سفال.
**زرنگە:** دەنگی وێك کەوتنی کانزا ف صدای به‌هم خوردن فلزات، درنگ.
**زرنگوهوڕ:** زرنگەی زۆر ف درنگ درنگ.
**زرنگەزرنگ:** زرنگەی زۆر ف درنگ درنگ.
**زرنگی:** چالاکی، مەزبوُتی، چوستی ف زرنگی.
**زرنگین:** زرنگە لێ‌هاتن ف صدای درنگ دادن.
**زڕنە:** زەنگ لێدان ف زنگ اخبار زدن.
**زڕنەڤان:** زوڕناژەن، زوڕنالێ دەر ف نوازندهٔ سُرنا.
**زڕنەقوُتە:** بەچکە چێشکەی تۆك لێ نەهاتو ف جوجه گنجشك پر درنیاورده.
**زرو:** ۱) زبر؛ ۲) گیایەکی گەڵاباریکە ف ۱) زبر، خشن؛ ۲) گیاهی است.
**زروبی:** کولێرەی تەنکی لەڕۆندا هەڵقرچاو، ناوساجی ف نوعی نان روغنی.
**زروُق:** ۱) ترسو لەلانە دەرپەڕینی نێچیر؛ ۲) [illegible]ـەی کەنی ساوا ف ۱) ترس و رمیدن نخچیر؛ ۲) صدای خندهٔ بچ[illegible]
**زروُقان:** ۱) بازرەبوُن؛ ۲) تریقەی پێکەنینی منداڵی ساوا ف ۱) متواری شدن نخچیر از ترس؛ ۲) هرهر خندهٔ نوزاد.
**زروُقانەوە:** تریقانەوەی منالی ساوا ف هرهر خندیدن نوزاد.
**زروُقاو:** بازرەبوُگ ف نخچیر از ترس متواری شده.
**زروُکە:** ۱) جروُکە، دەنگی مەلی پچوك؛ ۲) جیکی مشك ف ۱) صدای گنجشکان؛ ۲) ماژ موژ موش.
**زروُکە زروُك:** جروُکەجروُك ف صدای گنجشکان.
**زروە:** ۱) زبرە؛ ۲) گیایەکە ف ۱) زبر است؛ ۲) گیاهی است.
**زروی:** زروێ ف چوبك.
**زروێ:** ئەسپوُن ف چوبك لباسشویی، اشنان.
**زروێی:** زروێ ف چوبك.
**زرە:** سەرکەوای لە ئاسن هۆنراو کە بۆ شەڕ دەبەر دەکرا ف زره.
**زڕە:** ۱) دەنگی ڕاتڵەکانی زنجیر؛ ۲) گۆرانی گوتنی کەر؛ ۳) زڕ، بەدەڵ ف ۱) جرنگ؛ ۲) عرعر الاغ؛ ۳) بدل.

**زڕەباوێشك:** باوێشکی زل وزۆر ف خمیازه متوالی و طولانی.

**زڕەبلبل:** مەلێکی بۆری پچوکە دەنگی وەك بلبلە ف پرنده‌ای است کوچك خوش آواز.

**زڕەپنگ:** زڕپنگ ف نگا: زڕپنگ.

**زڕەزڕ:** دەنگی زڕەی زور ف صدای زرزر بسیار.

**زڕەق:** زرۆق، تریقەی ساوا ف صدای خندهٔ بچه.

**زڕەقیان:** کەنینی ساوا بە دەنگ ف خندیدن بچه با صدای بلند.

**زرەك:** تانەی سەر چاوی یەکسمو ماڵات کە لە بروسکەوە توشیان دێت ف لکهٔ چشم حیوانات از اثر برق.

**زڕەك:** ١) هەقمەق؛ ٢) شەڕفرۆش؛ ٣) وشکاو، کەم کردن: (گوهانێ چێلەکێ زڕەکان) ف ١) احمق؛ ٢) ستیزه‌جو؛ ٣) خشك شدن.

**زڕەکادەروێشی:** تایفەیەك لە مەنگوڕان ف طایفه‌ای از ایل منگور.

**زڕەکەو:** باڵدارێکە بۆرو لە کەو پچوکتر ف پرندهٔ کبك‌سان حلال گوشت.

**زڕەمار:** ماری زۆرزل ف مار بسیار بزرگ.

**زڕەمێر:** پیاوی بە هەیکەلو قەڵافەت ف لندهور.

**زرهۆك:** گوڵاباتون، ئەو شریتە رەنگینەی کە ملی عابای پێ دەڕەنگێنن ف گلابتون.

**زرێ:** ١) زره؛ ٢) دەلیا، دەریا: (زرێبار) ف ١) زره؛ ٢) دریا.

**زڕێ ئامایش:** ١) زەڕاندن؛ ٢) زەنازەنا کردن؛ ٣) بێ‌شەرم و شوُرەیی بوُن ف ١) عرعر کردن؛ ٢) شلوغ کردن؛ ٣) بی‌حیا بودن.

**زریا:** دەلیا، بەحر ف دریا.

**زڕیاگ:** ١) زڕاو؛ ٢) زنجیری ڕاتڵەکاوی دەنگ لێ‌هاتگ؛ ٣) زروُقاو، بازره ف ١) نگا: زڕاو؛ ٢) جلنگیده؛ ٣) حیوان متواری شده.

**زریان:** بای باشوُر، بای قوبڵە ف باد جنوب.

**زڕیان:** زڕان ف نگا: زڕان.

**زڕیانەوە:** دەنگی زنجیر لە بزوتنا ف جرنگیدن.

**زرێبار:** ١) رەخی دەلیا؛ ٢) وەك دەلیا؛ ٣) دەریاچە، گۆل؛ ٤) دەریاچەیەکە نێزیکی مەریوان ف ١) کرانهٔ دریا؛ ٢) دریاسان؛ ٣) دریاچه؛ ٤) دریاچه‌ای در مریوان.

**زرێپۆش:** ١) کەسێ کە زرێی دەبەردایە؛ ٢) هەرچی گوللە نایبڕێ ف ١) آنکه زره بر تن دارد، زره‌پوش؛ ٢) آنچه ضدگلوله است، زره‌پوش.

**زریچ:** قەڵایی، ئەو کانزا نەرمەی مسی پێ سپی دەکەنەوە ف قلع.

**زرێچ:** چرێش، ئەسرێلك، سرێش ف سریشم.

**زرێچە:** دەریاچە، زرێبار، گۆل ف دریاچه.

**زرێدار:** زرێپۆش ف نگا: زرێپۆش.

**زریز:** دڕکەزی، جۆرێ دەوەنی زۆر بەدڕکە ف نوعی درختچهٔ خاردار.

**زریزانە:** گیایەکە لە ناو گەنمدا دەڕوێ‌و بۆ گەنم زیانی هەیە ف گیاهی است آفت گندمزار.

**زریزە:** زنجیروکەی زۆر باریك ف زنجیر بسیار باریك.

**زریسك:** دارێکی کەمباڵایە بەرێکی ڕەش‌سوُری ترش دەگرێ‌و بەکاڵی‌و بەکوڵیوی دەخورێ ف زرشك.

**زریشك:** زریسك ف زرشك.

**زریك:** هاواری تیژو باریك ف جیغ.

**زریکان:** زریك ف جیغ.

**زریکاندن:** ١) بە دەنگی تیژو باریك هاوار کردن، قیژاندن؛ ٢) مچوڕك پێ داهاتنی ئەندام ف ١) جیغ کشیدن؛ ٢) تیرکشیدن اندام.

**زریکە:** ١) زریك؛ ٢) مچوڕك ف ١) جیغ؛ ٢) تیرکشیدن اندام.

**زریمزروك:** جۆرێ چوڵەکەی دەشت ف گنجشك سانی است.

**زڕین:** زڕان ف نگا: زڕان.

**زرینچك:** زەرداوی دەمی برین ف زردابهٔ دهانهٔ زخم.

**زرینچکاو:** زرینچك ف زردابهٔ دهانهٔ زخم.

**زرینگ:** زرنگ ف نگا: زرنگ.

**زرینگان:** زرنگان ف نگا: زرنگان.

**زرینگانەوە:** زرنگانەوە ف نگا: زرنگانەوە.

**زرینگە:** زرنگە ف نگا: زرنگە.

**زرینگین:** زرینگان ف صدای برخورد دوجسم فلزی.

**زرێوار:** زرێبار ف نگا: زرێبار.

**زرێوان:** کەسێ لە سەر دەریا کار دەکا ف کارگر در دریا.

**زریوە:** ١) تروکەی ئەستێرە: (ئەستێرە زریوە زریویانە)؛ ٢) جریوەی چوێلەکە ف ١) سوسو زدن ستاره؛ ٢) جیك‌جیك گنجشکان.

**زریوەزریو:** زریوەی یەك لەدوی یەك ف «زریوە»ی پیاپی.

**زریە:** دەلیا ف دریا.

**زسان:** سێ‌مانگەی پاشینی ساڵ، کژی سەرماوسوڵە ف زمستان.

**زستان:** زسان ف زمستان.

**زستانە:** شتێ کە تایبەتی زستانە ف زمستانی.

**زستانەزێ:** بەرخێ کە لەزستاندا لە دایك بوُبێ ف برهٔ متولد در زمستان.

**زستانەوار:** جێ ژیانی کۆچەر لەزستاندا، گەرمەسێر ف قشلاق.

**زستانەیی:** زستانە ف زمستانی.

**زستانی:** زستانە ف زمستانی.

**زشت:** ١) ناپەسند؛ ٢) ناحەز ف ١) و ٢) زشت.

**زغاڵ:** ڕەژی، ڕەژو، خەڵوُز، ڕێژی ف زغال.

**زغاڵدان:** ڕەژیدان ف اشبو، زغالدان.

**زغاڵدو:** زغاڵدان ف اشبو، زغالدان.

**زغرك:** بەردەورتکە ف سنگریزه.

**زفت:** جۆرێ قیلی کانزا کە بۆ دەرمان دەشێ ف نوعی قیرمعدنی.

**زفتك:** زیپکەی عازەوی کە لە روُی تازەلاوان پەیدا دەبێ ف جوش غرور.

**زفتی:** پیاوی داروٚغە ف مأمور شهربانی.

**زفر:** وردەو پردەی پەرژیوی ورکە نان‌و گرار ف ریزهٔ نان و غذای باقیمانده در سفره.

**زفقیل:** سەردەرانەی ماڵ ف سَر دَر خانه.

**زڤار:** بزگوڕ، تیتوڵ ف پارهٔ نواری از قماش.

**زڤارزڤار:** شڕو وڕ، لەت‌و پەت ف لت‌وپار.

**زڤاف:** ١) جۆرێ گاسن؛ ٢) ناوی گوندێکه ف ١) نوعی گاوآهن؛ ٢) نام دهی.

**زڤان:** جوجەڵە مریشك، بەچکەمامر ف جوجهٔ مرغ.

**زڤــڕ:** ١) خول، سوڕ؛ ٢) گەڕانــەوە، بەرەو دوا هاتنــەوە ف ١) چرخ، چرخش؛ ٢) برگشت.

**زڤـڕان:** ١) خول خـواردن؛ ٢) بەرەودوا هاتـنــەوە ف ١) چرخـیـدن؛ ٢) برگشتن.

**زڤــڕك:** جانــەوەرێکی سوورو زەردی چزو دارەو لە زەرگەتــە زلتــرە، ژەنگەسوورە، سێو ف زنبور سرخ درشت.

**زڤڕین:** زڤڕان ف نگا: زڤڕان.

**زڤستان:** زسان ف زمستان.

**زڤل:** سەرانگوێلك، جێ ریخ‌و شیاکە ف انبار پهن.

**زڤنگ:** ١) ئەشکەوت؛ ٢) ناوی گوندێکە؛ ٣) زستانە هەوار ف ١) غار؛ ٢) نام دهی است؛ ٣) قشلاق.

**زڤیر:** عاجز، ناڕەحەت ف افسرده، ناراحت.

**زڤیرك:** گێژەڵوکە ف گردباد.

**زق:** ١) خوس، خوسـار، سیخـوار، خوێس، زوقم، خویز؛ ٢) سەرمـاو بەستـەڵـەك؛ ٣) رەق‌و بەرجەستـە ف ١) پژ، سرماریزە؛ ٢) سرما و یخبندان؛ ٣) برجستە.

**زقاف:** خێشك، ئامرازێکە شێوەردی پێ لێك‌و لوس دەکەن ف ماله برای صاف کردن زمین زراعی.

**زقاق:** کوچە، کوڵان، تاخ ف کوچه.

**زقاو:** تەڕەزن، ئاوێ کە لە قەراغ مێرگ دەدەڵێ ف آب اضافی که از کنارهٔ چمنزار به بیرون می‌تراود.

**زق بیایەنە:** قیت‌و قنج وێستاوە ف راست ایستاده.

**زقل:** قسڵ، کلس ف آهك.

**زق‌و زوا:** زۆر زۆر وشك، فرە زوها ف تمام خشك.

**زقوم:** زۆر تاڵ وەك ژەهری مار ف بسیار تلخ.

**زقــوم نایش:** بە قوزەلقـورت بوون، نۆش نەبـون ف مقابل نوش‌جان شدن، کوفت شدن.

**زك:** ١) لە خوار دەفەی سنگەوە تا ڕان، زگ، سك؛ ٢) تۆل، پیزە: (برازنم زکی هەیە) ف ١) شکم؛ ٢) جنین.

**زك‌ئێشە:** دەردی ناو زك ف شکم‌درد.

**زك‌بەردان:** برێتی لە زۆر خواردن ف کنایه از پرخوری.

**زك‌بەل:** ورگن، تەنگە ئەستوور ف شکم گُنده.

**زکپڕ:** حامڵە، زگپڕ ف حامله، باردار.

**زك پێ سوتان:** بەزە پێدا هاتنەوە ف متأثر شدن.

**زك پێ شەوتین:** زك پێ سوتان ف نگا: زك پێ سوتان.

**زك تێر:** نەبرچی ف سیر، مقابل گرسنه.

**زك تێڕ:** زۆر خۆر ف پُرخور.

**زك‌چك:** والایی لەناو دڵدا ف فراخنای قلب.

**زك‌چون:** بەلەفیڕە ف اسهال.

**زکـدڕاو:** ١) برێتی لە زۆرخۆر؛ ٢) ناوی گوندێکە لە کوردستان ف ١) کنایه از پرخور؛ ٢) نام دهی است در کردستان.

**زك‌دێلك:** جۆرێ ماسی ف نوعی ماهی.

**زك‌ڕۆین:** زك‌چون ف اسهال.

**زکڕەش:** دەبنەوەبڕ، ڕکونی، ڕق‌لەزك ف بدنهاد، کینه‌ای.

**زك ڕەقی:** نەخۆشیەکی حەستەمە ف کزاز.

**زکزل:** ورگن ف شکم گنده.

**زکسوتان:** برێتی لە مناڵ‌مردن ف کنایه از مرگ فرزند.

**زکسوتاو:** فرزەند مردگ ف فرزند مرده.

**زك‌شەوات:** زك‌سوتاو ف فرزند مرده.

**زك‌شەواتی:** زك‌سوتان ف مردن فرزند.

**زك کردن:** مناڵ‌هێنان، دژی نەزۆکی ف بچه آوردن، مقابل نازایی.

**زك کور:** چڵێس، بەرچاوبرسی ف حریص در خوردن.

**زك کێشکی:** لە سەر زگ خزین ف برشکم خزیدن.

**زك گرتی:** قەبز، دژی زگ ڕەوان ف یبس.

**زك گیری:** قەبزایەتی، دژی‌ڕەوانی ف یبوست.

**زك‌له وەڕاندن:** چڵێسی، ماڵەوماڵ کردن بۆ خواردن ف سورچرانی.

**زك‌لەوەڕێن:** چڵێس ف سورچران، طفیلی.

**زکماك:** هەر کە لە دایك بوە: (کوێری **زکماك**) ف مادرزاد.

**زکمانگ:** زکماك ف مادرزاد.

**زکن:** چڵێس، زۆرخۆر ف سورچران، شکم‌پرست.

**زکوزا:** زاوزو ف موالید.

**زکوزاکەر:** ژنێ کە لە زان ناوەستێ ف زنی که از زاییدن بازنمانده.

**زکون:** چڵێس، زك‌کور ف حریص در خوردن.

**زکونی:** چڵێسی ف شکم‌برستی.

**زکەشۆرە:** بەلەفیڕە ف اسهال.

**زکەشۆرێ:** زکەشۆرە ف اسهال.

**زکەماسێ:** نەخۆشی ئاوبەند، ئیسقایی ف بیماری استسقا.

**زکی‌پێ:** قوڵایی ناوەندی بەری‌پا ف قوس پا.

**زکین:** زکونی، چڵێس ف شکم‌پرست.

**زگ:** بڕوانە «زك»و هەرچی لەدوای ئەم وشە هاتوە ف نگا: «زگ» و متفرّقاتش.

**زگار:** ١) زبارە، هەرەوەز؛ ٢) کزو کەنەفت‌و دڵ‌بەخەم؛ ٣) ورکە بەرد ف ١) تعاون کشاورزان؛ ٢) ملول و افسرده و لاغر؛ ٣) سنگریزه.

**زگانە:** ژیاندن بە نانەزگ ف نگهداری کردن با غذای بخورو نمیر.

**زگ‌شێلان:** برێتی لە زۆرمیوان بونی کەسێك ف کنایه از زحمت مهمان شدن.

**زگـورد:** ١) ڕەبـەن، سەڵت، پیـاوێ کە ژنی نەهێناوە؛ ٢) بێچـارە ف ١) مجرّد، نامتأهل؛ ٢) بیچاره.

**زگەڕۆ:** زکدڕاو ف کنایه از پرخوری.

**زل:** ١) درێژو ئەستـور، گەورە؛ ٢) پایەبەرز، بەدەسەڵات؛ ٣) تواشا بە چاوەرپــەڕیوی: (**زل‌زل** تواشـای کردم)؛ ٤) پۆشکـەی باریکی

لاسکی گیا؛ ٥) ئەستێرەکە، ئەستێرەی ڕۆژێ؛ ٦) میتکەی مێوینە؛ ٧) چیتك ف ١) بزرگ‌جثه؛ ٢) بلندپایه؛ ٣) نگاه خیره؛ ٤) ساقهٔ لخت و کندهٔ گیاه؛ ٥) ستارهٔ سحری؛ ٦) چچول؛ ٧) نی.

**زلاقوُنك:** پوُش بەقنگە، زل‌بەقوُنە ف سنجاقك.

**زلام:** ١) گەپ، زل؛ ٢) نۆکەر؛ ٣) پیـاوی بێ‌ناو ف ١) بزرگ‌جثـه؛ ٢) نوکر؛ ٣) مرد بی‌نام و نشان.

**زلان:** ١) زریان؛ ٢) باهۆز، گێژەلۆکە ف ١) باد جنوب؛ ٢) گردباد.

**زلبری:** بیچەك، تۆزولکە، کەموسکە، بڕۆکە ف کمترین مقدار.

**زلبـوُن:** ١) لە پچـوُکی دەرچوُن، بالاکـردن؛ ٢) پایە بەرەژوُرچوُن ف ١) نموکردن؛ ٢) بلندپایه شدن.

**زلبـەقـوُنە:** جانەوەرێکی چواربالّی قنگ درێژە لەنێوان پەپولەو کلۆدا، پۆش‌بەقنگە ف سنجاقك.

**زلپاتە:** زلبری ف نگا: زلبری.

**زلپك:** زیك، زیرکە ف جوش صورت.

**زلّچە:** دەنگی شتی تەڕی نەرم کە پای لێ نێن یان بە دەست بیگوشن: (کـەوشەکەم هەر **زلّچەی** دێ، پلاوەکە هەر **زلّچەی** دێت) ف صدای جسم تر نرم که با پا یا دست فشرده شود.

**زلّچەزلّچ:** زلّچەی لە دوی یەك ف «زلّچە»ی پیاپی.

**زلحوّ:** تەژەی ناقۆلا ف لندهور بدقواره.

**زلحوّرت:** زلحوّ ف نگا: زلحوّ.

**زلزل:** تماشاکردنی بە چاوەدەربەڕاوی ف خیره‌خیره نگاه کردن.

**زلزلە:** کێم‌و هەوای برین، چلکی برین ف ریم، چرك زخم.

**زلف:** زلّف ف زلف.

**زلّف:** پرچ، کەزی، بسك، دەستە توُکە سەری سەر لاجانگ ف گیسو، موی برعذار، زلف.

**زلّفـــج:** ١) گیایەکی تالّو ژاراوی کە تۆزەکـەی دەرمـانی گیانـداری کرمێ‌یە؛ ٢) جوێنێکـە وەك سندان، قوزەلّقورت ف ١) گیاهی است ضد کرمویی دام؛ ٢) کلمه‌ای به‌جای کوفت و زهرمار.

**زلّفنچك:** چلك‌و کێم لە برین ف چرك زخم.

**زلفوّ:** ١) پیاوی بەسەرو پرچو کاکۆلّ؛ ٢) ناوە بۆ پیاوان ف ١) مرد موی سر و کاکل‌دراز؛ ٢) نام مردانه.

**زلق:** بزۆزو هارو هاج ف بازیگوش، ناآرام.

**زلّـق:** ١) سەوزی‌یەکـە خـزمی چوێـنـەر گەلای بۆ دولّمـەو ئاش دەبێ؛ ٢) حەڕیو لیتـەی خلیسـك ف ١) نوعی سبزی از تیرهٔ چغندر؛ ٢) گل و لای لیز.

**زلّقاو:** ١) قوڕو لیتە، حەڕیا تراو؛ ٢) ئاشی سلّق ف ١) منجلاب؛ ٢) شلهٔ گیاه «زلّق».

**زلقتی:** ١) مۆزە زەردە؛ ٢) زەرگەتە، زەردەواڵە ف ١) نوعی مگس که به حیوانات نیش می‌زند؛ ٢) زنبور زرد.

**زلك:** زڕو زەلام ف تنومند گنده.

**زلکوُر:** کەسێ کە چاوی بەدیمەن ساغەو ناش بینێ ف نابینایی که عیب در چشمش ظاهر نیست.

**زلکوێر:** زلکوُر ف نگا: زلکوُر.

**زلکە:** ١) جۆرێ ترێ؛ ٢) جۆرێ سلّق ف ١) نوعی انگور؛ ٢) گیاهی از تیرهٔ چغندر.

**زللك:** ١) بەلۆکە؛ ٢) دەنکە شەمچە ف ١) چچوله؛ ٢) چوب کبریت.

**زللە:** ١) بە پانایی دەست لەلارۆمەت دان، شەق، شەقام، شەپەلاخە؛ ٢) گالّتەجار ف ١) سیلی؛ ٢) مسخره.

**زلّم:** نارەوایی ف ظلم.

**زلمیۆ:** گەزۆ، شیلەی دار مازو کە وەك شەونم دەبارێ ف شیرهٔ درخت مازوج.

**زلمزۆ:** گەزۆ ف گز قنادی.

**زلوُبی:** زروُبی، ناوساجی ف نگا: زروُبی.

**زلوُبیا:** جۆرێ شیرنی لە شیرنی‌خانە ئەیکەن، لە ڕەگەزدا واتا: شیاوی پارولێ گرتن ف زلوبیا، زولبیا.

**زلــوُت:** ١) ڕۆتی باریك؛ ٢) سەربێ مو؛ ٣) ڕوُت و قوُت ف ١) لخت باریك؛ ٢) سر طاس؛ ٣) عریان.

**زلوُر:** قەسەلّی ناو تاخوڕ، کای درشتی بەرماوی مالاّت ف پس‌ماندهٔ کاه در آخور.

**زلورە:** زلوُر ف نگا: زلوُر.

**زلوّق:** زەق، مۆلەق: (چاڤی ڤێ **زلوّق** مان) ف چشم خیره و برآمده.

**زلوُك:** ١) چیلکەی کورتی باریك؛ ٢) دەنکە شەمچە ف ١) چوب کوتاه باریك، خلال؛ ٢) چوبك کبریت.

**زلوُکە:** زلوُك ف نگا: زلوُك.

**زلە:** ١) پیاوی تەژە، زل: (کابرایەکی **زلە هاتە لام**)؛ ٢) شەقام، زللە ف ١) تنومند؛ ٢) سیلی.

**زلّە:** چەقەو هەرا، چەقەچەق ف همهمه و جنجال.

**زلّەزل:** زلّەی زۆر ف جنجال زیاد.

**زلّهە:** زلّە ف نگا: زلّە.

**زلی:** ١) زلامی، ئەستـوُری‌و درێژی؛ ٢) پایە بەرزی ف ١) گنـدگی و درازی؛ ٢) بلندپایگی.

**زلیّ:** سوکەلەناوی زلێخا ناوی ژنانە ف مخفف زلیخا نام زنانه.

**زلیتاو:** چلّپاو، قوڕو لیتە ف لای و لجن.

**زلێخـا:** ناوی ژنـەکوێخایەکی فیرعەونی میسر بوە کە وسوُ پێغەمبەری کڕیوەو خۆشی ویستوە ف زلیخا.

**زلیقوّ:** دەموُکانە، جۆرێ چەسبە ف مویزك، نوعی چسب.

**زم:** سەرما، ساردی ف سرما، سردی.

**زما:** سەرما، زم ف سرما.

**زمـاك:** نزار، نسار، شوێنێ لە چیا کە تاوی وێ ناکەوێ ف جای همیشه سایه در کوه.

**زماکی:** زمانی دایکی ف زبان مادری.

**زماگ:** نسار، زماك ف جای همیشه در سایه.

**زمان:** زبان ف نگا: زبان.

**زمان‌بەد:** جنێوفرۆش ف بدزبان.

**ساله:** کورتەی ناوی صالح ف مخفف صالح.

**ساڵە:** ۱) ساڵ: (**ساڵەوەخت، ساڵەوساڵ**)؛ ۲) کورتەی ناوی صالح ف ۱) سال؛ ۲) مخفف صالح.

**ساڵها:** تیرەیەکە لەهۆزی هەڤێرکان ف عشیرتی است در کردستان.

**ساڵـەیی:** گونـدێکی کوردستانە بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای کردستان که بعثیان ویران کردند.

**ساڵــەیی‌ماشــە:** گونـدێکی کوردستـانـە بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای کردستان که بعثیان ویران کردند.

**ساڵیان:** ساڵان ف نگا: ساڵان.

**ساڵی‌پڕ:** ساڵێ کە مانگی رەشەمەی سی‌ڕۆژ بێ ف سال کبیسه.

**ساڵیانه:** ۱) ساڵبڕ؛ ۲) ساڵانە، هەرساڵ ف ۱) سالگرد؛ ۲) هرسال.

**سالیس:** پەیاغی لوس و حولی ف چوبدست کلفت و صاف.

**سالین:** ساڵیانە ف سالانه.

**سام:** ۱) ترس، خۆف؛ ۲) سێو ف ۱) هیبت، مهابت؛ ۲) سیب.

**سامال:** ئاسمان بێ‌هەور ف آسمان بی‌ابر.

**سامالکردن:** ڕەوینی هەوران لە عاسمان ف رمیدن ابرها.

**سامالەکردن:** خێشك لە شێوەرد دان ف صاف کردن شخم.

**سامـــان:** ۱) دارایی، دەولــەت؛ ۲) هێمنی و ئارامی ف ۱) دارایی؛ ۲) امنیّت، امان.

**ساماندار:** دەوڵەمەند ف ثروتمند.

**ساماندان:** ڕێك‌وپێك کردن، تەکوزکرن ف تنظیم نمودن.

**سامانگه:** خەزێنە، سندوقی پارەو پوڵ ف گنجینه.

**سامتور:** ساقۆ، پاڵتاو، باڵتە ف پالتو.

**سامتی:** سامتین ف نوعی نخ برّاق و محکم.

**سامتیك:** سامتین ف نوعی نخ براق و محکم.

**سامتین:** جۆرێ دەزوی قایم و بریقەدار ف نوعی نخ برّاق و محکم.

**سامدار:** جێگەی ترس، بەهەیبەت ف مهیب.

**سامڕەند:** کێوێکە لە کوردستان ف نام کوهی است.

**سام کردن:** ترسان ف ترسیدن.

**ساموتك:** ڕەشایی لە دوورەوە، تارمایی ف شبح، سیاهی از دور.

**سامور:** سمۆرە ف سمور.

**سامۆرته:** ئاڵقەو بەندی پاشکۆی زین ف فتراك.

**سامناك:** سامدار ف سهمناك.

**سامنج:** بەگیرەو سەرسەخت ف سمج، لجباز.

**سامه:** ۱) پەیمان، مەرج، قەرار؛ ۲) واو، وام، قەرد، دەسقەرز؛ ۳) پەناگا، داڵدە، پەسیو ف ۱) پیمان؛ ۲) وام؛ ۳) پناهگاه.

**سامیتی:** سامیتیل ف نگا: سامیتیل.

**سامیتیل:** بەن‌کەڵــەوە. *بەنێ کە دو داری بە ئاڵقــەی ملی گاجـوت بە نیرەوە گرێ دەدا* ف بند چنبرهٔ گردن گاو به یوغ.

**سامیر:** ۱) جۆرێ هەرزن؛ ۲) جۆرێ لۆرك، جۆرێ ژاڵــە ف ۱) نوعی ارزن؛ ۲) نوعی خرزهره.

**سامیری:** دەزگایەك یان ڕێوشوێنێك کە پەیوەندی دەگەڵ دەوڵەت هەیەو تەواویش دەوڵەتی نیە، نیوەدەوڵەتی ف شبه رسمی، نیمه رسمی.

**سان:** ۱) سوڵتـان، نازنـاوی میرانی هەورامـانـە؛ ۲) تەپاڵەدەشتی؛ ۳) پاشگری بەواتا: جێگە: (**عەجەمسان**)، ستان؛ ۴) ڕانانی لەشکر؛ ۵) بەردی لوسی چەقــوتیژ کردن، هەســان ف ۱) سلطان؛ ۲) سرگین خشك؛ ۳) جای، ستان؛ ۴) رژه؛ ۵) فسان، سنگ چاقو تیزکنی.

**سانا:** ئاسان، نەدژوار ف آسان، سهل.

**سانالە:** مشتاغ، جێگەی میوە هەڵخستن لەبەر تاو ف جای میوه خشك کردن در آفتاب.

**سانـاهی:** ۱) ڕەحـەتی، بێ دژواری؛ ۲) ئاسـودەیی، بێ‌خەمی ف ۱) بەآسانی؛ ۲) آسودگی.

**سانای:** کڕین، سەندن ف خریدن، خرید.

**سانایی:** ساناهی ف نگا: ساناهی.

**سان‌بەستن:** ڕیزبەستن، بەڕیزبون ف صف بستن.

**سانجن:** ۱) قۆڵنج، دەردی ناوشان؛ ۲) سندان، دەردێکە یەکسم دەکوژێ ف ۱) قولنج؛ ۲) نوعی بیماری کشندهٔ ستور.

**سانجۆر:** جۆرێ زگ‌ئێشە ف نوعی شکم درد شدید.

**سانجۆل:** ساجور، داری بە پەتی ملی سەگەوە بەستراو ف ساجور.

**سانجی:** ۱) سانجن؛ ۲) سانجۆل ف ۱) نگا: سانجن؛ ۲) ساجور.

**سانیه:** بەشێك لە شەست پاژی دەقیقە، چرکە ف ثانیهٔ ساعت.

**ساو:** ۱) تیژکراو بە سان؛ ۲) سامال؛ ۳) پیا ساوین، لێخستن، ڕێخستن؛ ۴) تیژایی دەمی تیغ؛ ۵) میوەی خۆشی بەنـاوبانگ، سێو، سام؛ ۶) ئیسراحـەت کردو؛ ۷) مەتـرسی و هەیبـەت، سام ف ۱) تیز شده با افسان؛ ۲) آسمـان صاف؛ ۳) سودن، مالیدن؛ ۴) تیزی لبهٔ تیغ؛ ۵) سیب؛ ۶) آسوده؛ ۷) هیبت.

**ساوا:** ۱) ساڤا؛ ۲) دەست ڕێخستن، پیاماڵین ف ۱) نورسته، نورسیده؛ ۲) مالش.

**ساوار:** ساڤار ف بلغور.

**ساواز:** ڕوهەڵماڵاو، ڕوقایم، بێ‌شەرم ف پررو، شوخ چشم.

**ساواق:** سەرمای زۆر ف سرمای سخت.

**ساواڵە:** کارژیلە ف بزغاله

**ساواما:** زاوماك ف بچه‌های گله با مادران.

**ساوان:** ۱) پیامــاڵین، پێداهێنــان، لێخستن، ڕێخستن؛ ۲) لوس‌بونو کەم‌کردن لەبـەر زۆر دەکـارهێنـان، سوان ف ۱) مالیدن، سودن؛ ۲) ساییده شده.

**ساوانی:** هەستێ کە دەست و پێست دەیکا ف حسّ لامسه.

**ساوایی:** ۱) ساڤایی؛ ۲) ساوانی ف ۱) دوران تازه رسیدن؛ ۲) لامسه.

**ساودان:** بە هەسان داماڵینی تیخ ف برفسان مالیدن تیغ.

**ساور:** ساوار ف بلغور، افشه.

**ساورمه:** داری وشکی زۆپە، قەڵا شکەری ف هیزم شکسته برای بخاری.

**ساورین:** چێشتی شلەساوار ف آش بلغور.

**ساورێن:** سابرێن، نێری، تەگە ف تکه، شاك، نخراز.

**ساوُن:** سابوُن ف صابون.

**ساوه:** ئەستێرەکی گەڕیدەیە لە عاسمان، زاوه، زاڤ ف سیارهٔ عطارد.

**ساوەر:** ساوار ف بلغور.

**ساوەساو:** سستی، تەمەڵی: (**ساوەساو مەکە**) ف سستی، تنبلی.

**ساوەری:** پیتاك بەرانبەر بە هەریەك لە خێزانی ماڵ، سەرانە ف جزیه، سرانه.

**ساوەرین:** سابرێن ف شاك.

**ساوەڵ:** شەڵتە. *داری بەردکێشانی دوتایی کە دەخرێتە سەر پشتی بارەبەر* ف سنگ‌کش چوبین که بر پشت الاغ گذارند.

**ساوی:** چێشت‌و نان کە لە ماڵان کۆی دەکەنەوە ف خوراکی که از خانه‌ها جمع‌آوری کنند.

**ساویاگ:** ۱) بە هەسان تیژکراو؛ ۲) سواو، لوُس‌و کەم‌کردو لەبەر دەکارهێنانی زۆر ف ۱) برفسان مالیده؛ ۲) ساییده.

**ساویان:** ساوان ف نگا: ساوان.

**ساویاو:** ساویاگ ف نگا: ساویاگ.

**ساویر:** ۱) ساو، مەترسی، هەیبەت؛ ۲) دە هزرەوەچوُن، خەیاڵات ف ۱) هیبت؛ ۲) توهّم.

**ساویلکە:** سافیلکە ف ساده‌لوح.

**ساوین:** ۱) ساوان؛ ۲) وردکردن: (لە ناو ئاونگدا باش **بیساوە**) ف ۱) نگا: ساوان؛ ۲) خرد کردن.

**ساوینەوە:** ۱) وردکردن‌و کردنەتۆز؛ ۲) هێنان‌و بردن لە ئاودا بە نهیم: (لە کەشك ساوینەوە ئازایە. کەشك بساوە) ف ۱) خرد کردن؛ ۲) در آب با فشار حرکت دادن چیزی مانند کشك.

**ساهل:** جنۆکە ف جن.

**ساهمەك:** سام، ترس، عەیبەت ف هَیْبَتْ.

**ساهی:** ساماڵ ف صافی آسمان.

**سای:** ۱) سا، سێبەر، سێوەر؛ ۲) تارمایی ف ۱) سایه؛ ۲) شبح.

**سایسە:** ساویاگ ف نگا: ساویاگ.

**سایقە:** ۱) ساواق، سەرماو بەستەڵەگ؛ ۲) ساو، عاسمانی ساو ف ۱) سرمای یخبندان؛ ۲) آسمان صاف.

**سایلە:** میوانی، چێشتی گەنمی بۆدراو دەگەڵ ڕۆن ف کاچی.

**سایمە:** جۆرێ نەخۆشی ئاژەڵ‌و ماڵات ف نوعی بیماری دام.

**سایمەل:** سایمە ف نگا: سایمه.

**ساین:** ساو، عاسمانی ساف ف آسمان صاف.

**ساین قەڵا:** شارۆکێکە ف نام شهرکی است، شاهین‌دژ.

**سای‌واز:** ساواز ف نگا: ساواز.

**سایە:** ۱) سا، سێبەر؛ ۲) خوێندنی دەرسی بێ حینجەکردن؛ ۳) ژەنگی ئاسن؛ ۴) پێش وشەی سەرمایە واتا: دارایی: (**سایەو سەرمایەم چو**)؛ ۵) وشەیەکە لە قوماری پەڕاندا دەگوترێ؛ ۶) باڵاپۆشی پێش ئاواڵەی ژنانە؛ ۷) وشتری نارەسەن ف ۱) سایه؛ ۲) خواندن درس بدون تهجّی؛ ۳) زنگار آهن؛ ۴) کنایه از دارایی؛ ۵) اصطلاحی در بازی ورق؛ ۶) نوعی بالاپوش جلوباز زنانه؛ ۷) شتر نااصل.

**سایەبان:** ۱) هەرچی سای هەیە، بەسێبەر؛ ۲) بڕێتی لە پیاوی مەردو خاوەن چاکە ف ۱) سایبان؛ ۲) کنایه از نیکوکار.

**سایەپۆش:** کۆڵانی تەنگ کە سەری خانوەکان گەیونە یەك ف کوچهٔ تنگ که در آن بالای خانه‌ها بهم رسیده باشد.

**سایەچەور:** پیاوی دەهندەو دلۆڤان ف آدم بخشنده و مهربان.

**سایەدار:** پەنادەری لێقەوماوان ف کسی که خانه‌اش پناهگاه بینوایان است.

**سایەقە:** سایقە ف نگا: سایقه.

**سایەك:** سا، سایە، سێوەر ف سایه.

**سایەوان:** سایەبان ف نگا: سایه‌بان.

**سایەوْشك:** بڕێتی لە ڕژد، چرۆك، چکۆس، دەس قوُچاو، ڕەزیل ف کنایه از خسیس.

**سایی:** ساو، عاسمانی بێ‌هەور ف آسمان صاف.

**سایین:** ساوین ف سودن.

**سب:** بەیانی، سو، سبەینە ف بامداد، صبح.

**سبا:** بەرەبەیان: (سبای ساڵحان) ف بامداد.

**سبات:** ۱) پایەداری، بەرقەراری؛ ۲) زەردی ئامال سپی؛ ۳) دوهەم مانگی زستان ف ۱) ثبات؛ ۲) زرد مایل به سفیدی، کرم؛ ۳) ماه دوم زمستان.

**سبادەرەوین:** فەجری کازیب، کازیوە ف فجر کاذب.

**سبت:** گیایەکی بۆن خۆشە ف گیاهی است خوشبو.

**سبحە:** ۱) سۆزی، بەیانی، ڕۆژی دوایی؛ ۲) بەرەبەیان ف ۱) فردا؛ ۲) بامداد.

**سبحەی:** ڕۆژی دوایی ف فردا.

**سبحەینان:** بەیانان، لە سەرەتای هەر ڕۆژدا ف بامدادان.

**سبحەینێ:** ۱) ڕۆژی دوایی؛ ۲) بەرەبەیان، شەوەکی ف ۱) فردا؛ ۲) بامداد.

**سبر:** زبر، زوُر ف خشن.

**سبری:** زبری ف خشونت.

**سبزو:** ۱) بەرەبەیان، شەوەکی؛ ۲) ڕۆژێ دادێ زۆر زو ف ۱) بامداد، پگاه؛ ۲) فردا زود.

**سبە:** ڕۆژێ دادێ ف فردا.

**سبەتر:** دوسبەی ف پس‌فردا.

**سبەی:** سبە ف فردا.

**سبەینان:** سبحەینان ف بامدادان.

**سبەینە:** سبحە ف نگا: سبحه.

**سبەینێ:** سبحەینێ ف نگا: سبحه‌ینێ.

**سبەینێیان:** سبەینان ف بامدادان.

**سبێ:** سبەینێ ف نگا: سبه‌ینێ.

**سبیانێ:** سبەینێ، سبحەینێ ف نگا: سبحه‌ینێ.

**سبیل:** ۱) موی سەر لێوی پیاو؛ ۲: ئامرازی توتن کێشان لە قوڕ ف ۱) سبیل؛ ۲) چپق گِلی.

**سپ:** تەواو، بێزیادو کەم [ف] کاملاً.

**سپا:** لەشکر، ئۆردو [ف] سپاه.

**سپات:** ١) سبات، رەنگی زەردی ئاماڵسپی؛ ٢) بێماڵو حاڵ، بێژن: (سەڵتو سپاتم) [ف] ١) رنگ کرم؛ ٢) مجرد.

**سپاتە:** بێژنو ماڵ، ڕەبەن، دوای وشەی سەڵتی دەڵێن: (**سەڵتو سپاتە**) [ف] نامتأهل، مجرّد.

**سپاخانە:** جێگەی ژیانی لەشکر [ف] پادگان.

**سپادار:** سەرکردەی لەشکر [ف] سپهدار.

**سپاڕانی:** لەشکرکێشی [ف] لشکرکشی.

**سپارتن:** ئەسپاردن [ف] سپردن.

**سپارتی:** ئەسپاردە [ف] سپردە.

**سپاردن:** ئەسپاردن [ف] سپردن.

**سپاردە:** ئەسپاردە، سپارتی [ف] سپردە.

**سپاردەیی:** ئەسپاردەیی [ف] سفارش، سپردن.

**سپاردی:** ١) ئەسپاردە؛ ٢) ئەسپاردی [ف] ١) سپردە؛ ٢) سپرد.

**سپارە:** ئەسپاردە، سپاردە [ف] سپردە.

**سپارەیی:** ئەسپارەیی، ئەسپاردەیی [ف] سفارش.

**سپاس:** بەچاکەزانین، چاکە لەبەرچاوبوُن [ف] تشکّر، سپاس.

**سپاسالار:** سەرکردەی گەورەی هەمو لەشکر [ف] سپهسالار.

**سپاسکار:** بەئەمەگ [ف] سپاسگزار.

**سپاگە:** سپاخانە [ف] پادگان.

**سپایی:** ١) چەکداری لەشکر؛ ٢) لەسەرەخۆ، سەبر، هێدی: (**بە سپایی** وەرە)؛ ٣) خان، ئاغا، خاوەن چەکدار [ف] ١) سپاهی؛ ٢) یواشکی؛ ٣) ارباب، خان.

**سپپی:** ئەسپێ، سپێ [ف] شپش.

**سپر:** ئالۆ، هەڵۆ [ف] عقاب.

**سپڵ:** پارچەگۆشتێکی ڕەشە لە هەناودا [ف] طحال، سپرز.

**سپڵۆ:** بەشدار، چوارپێ، سە، سەگ، گەماڵ، کسوٚك، کوُچْك [ف] سگ.

**سپڵۆت:** ١) سپڵۆ: ٢) پیسو گڵاو [ف] ١) سگ: ٢) نجس.

**سپڵۆتی:** گڵاو، پیس [ف] نجس.

**سپڵۆك:** سپڵۆت [ف] نگا: سپڵۆت.

**سپلوێنـك:** داری وشکی لەبـەر خۆرەتـاو چەرموگ بوُگ [ف] چوب در آفتاب خشکیدهٔ سفید شده.

**سپڵە:** پێ نەزان، بێئەمەگ [ف] بی‌وفا، ناسپاس.

**سپڵی لاورگ:** برێتی لە گرانجانی دەست هەڵنەگر [ف] کنایه از مزاحم گرانجان.

**سپناخ:** ئەسپەناخ، ئەسپەناغ [ف] اسفناج.

**سپندك:** گیایەکە دەیخۆن [ف] گیاهی است خوراکی.

**سپنگ:** شنگ [ف] شنگ.

**سپوُچك:** چەرمێنەی هێلکە [ف] سپیدهٔ تخم‌مرغ.

**سپوردە:** ١) ئەسپێراو؛ ٢) لەخاکدا وەشێراو [ف] ١) سپردە؛ ٢) دفن شده.

**سپـۆن:** ئەسپۆن، بنەگیایەکە. کەف دەکاو جلی پێ دەشۆن [ف] اشنان، چوبك رختشویی.

**سپە:** ١) سپڵۆ؛ ٢) ئەسپێ [ف] ١) سگ؛ ٢) شپش.

**سپەر:** چەپەر، خەڵ، سەنگەر؛ ٢) مەتاڵ [ف] ١) سنگر؛ ٢) سپر.

**سپەڕ:** چوارپێ، سەگ [ف] سگ.

**سپەردە:** ئەسپاردە [ف] سپردە.

**سپەناغ:** ئەسپەناغ [ف] اسفناج.

**سپـەهی:** ١) جوان، خوشیك؛ ٢) باش چاك، پەسنـد [ف] ١) زیبـا؛ ٢) خوب، نیك.

**سپەیی:** زۆرباش [ف] بسیار خوب.

**سپەیین:** قوماربازی، گزیکاری [ف] نیرنگ.

**سپی:** ١) چەرمـوگ، چەرمـگ؛ ٢) گیایەکـە؛ ٣) سپیایی وەك ماستو شیرو...؛ ۴) ئەسپێ؛ ۵) تێخـوڵ لێ دارنـاو [ف] ١) سپید؛ ٢) گیاهی است؛ ٣) سفید شیری؛ ۴) شپش؛ ۵) پوست کنده.

**سپێ:** ئەسپێ، سپە [ف] شپش.

**سپیاتی:** ١) چەرمگی؛ ٢) برێتی لە ماستو دۆ [ف] ١) سفیدی؛ ٢) کنایه از لبنیّات.

**سپیاڤ:** دەرمانی دەموچاو سپی کردن بۆ خۆ جوان‌کردن [ف] سپیداب آرایش.

**سپیاڤکرن:** خۆجوان کردن بە سپیاڤ [ف] آرایش با سپیداب.

**سپیان:** گۆشت مەڕ [ف] گوشت گوسفند.

**سپیاو:** سپیاڤ [ف] سفیداب آرایش.

**سپیاوکردن:** سپیاڤ کرن [ف] آرایش با سپیداب.

**سپیاووکە:** شۆرباو هێلکە [ف] شوربای تخم‌مرغ.

**سپیاهی:** سپیاتی [ف] نگا: سپیاتی.

**سپیایی:** سپیاتی [ف] نگا: سپیاتی.

**سپی بالا:** بوُلێڵە، کازیوەی بەیان [ف] فجر کاذب.

**سپـی بۆرە:** سپـی پات، ئەسپی سپی خاڵ ڕەش [ف] اسب سفیدی که خالهای سیاه دارد.

**سپی بۆز:** ئەسپی سپی ئاماڵ بۆر [ف] اسب سفید مایل به خاکستری.

**سپی بوُن:** ١) چەرمـگ بوُن؛ ٢) ڕەنگ پەڕین [ف] ١) سفید شدن؛ ٢) رنگ باختن.

**سپی بوُنەوە:** ١) چەرمگەو بوُن؛ ٢) ڕەنگ پەڕین لە ترسان [ف] ١) تغییر رنگ دادن به سپیدی؛ ٢) رنگ باختن از ترس.

**سپی پات:** سپی بۆرە [ف] نگا: سپی بۆرە.

**سپیتاڵە:** سپی ئاماڵ گەنم ڕەنگ، سپی ئەسمەر [ف] گندم‌گون مایل به سپیدی.

**سپێتی:** چەرمگی، سپیاتی [ف] سفیدی.

**سپیچك:** ١) سپێنەی چاو؛ ٢) سپێنەی هێلکە [ف] ١) سفیدی چشم؛ ٢) سفیدهٔ تخم‌مرغ.

**سپی‌چۆلك:** ڕەنگی خاکی، ئاخ ڕەنگ [ف] خاکی رنگ.

**سپیدار:** ئەسپیندار، سپیەچنار، سپیندار [ف] درخت تبریزی.

**سپیدبالا:** سپی بالا [ف] فجر کاذب.

**سپیدپەهنا:** بەیانی ڕوٌن، هەوەڵ بەیان [ف] فجر صادق.

**سپیده:** بەرەبەیان [ف] بامداد، پگاه.

**سپێده:** سپیده [ف] بامداد، پگاه.

**سپیدەمان:** ۱) بەرەبەیان؛ ۲) کەم عەیار، زێڕی ناخالیس: (کورمانجی‌یە سیرفە بێ‌گومانە / زێڕنینە ببێن **سپیدەمانە**) «خانی» [ف] ۱) پگاه؛ ۲) طلای ناخالص، کم‌عیار.

**سپێر:** ۱) چەپەر، خەڵ، سەنگەر؛ ۲) مەتاڵ، مەرتاڵ. *ئامرازی شەڕکەر کە بۆ خۆپاراستن لە برینی شەمشێر بەکاریان دەبرد*؛ ۳) ئامرازی زێدە بۆ کار، یەدەکی [ف] ۱) سنگر؛ ۲) سپر؛ ۳) ابزار یدکی.

**سپی سەنگ:** کێوێکە لە کوردستان [ف] نام کوهی در کردستان.

**سپیك:** سپێنەی هێك [ف] سفیدهٔ تخم‌مرغ.

**سپی کاری:** دیوار بە گەچ سواغ‌دان، گێچ بە دیواردا ماڵین [ف] گچ کاری.

**سپی کردن:** ۱) موٌڕنینەوە لە پێستەو پێست؛ ۲) تویکڵ لێ‌کردنەوە؛ ۳) برێتی لە کوشتن، مراندن [ف] ۱) پر و موی کندن از پوست؛ ۲) پوسته کندن؛ ۳) کنایه از کشتن، میراندن.

**سپی کردنــــەوە:** ۱) دەفــــری مس بە قەلآیی سواغ‌دان؛ ۲) برێتی لە مراندن [ف] ۱) سفیدکاری ظروف مسین؛ ۲) کنایه از میراندن، کشتن.

**سپیکە:** ۱) جۆرێ ترێ؛ ۲) فەرمان بە سپی کردن [ف] ۱) نوعی انگور؛ ۲) فرمان به «سپی» کردن.

**سپیکەلە:** تاماڵ‌سپی، سپی‌واش [ف] مایل به سفید.

**سپــیلك:** ۱) ئەســپــی سپــی؛ ۲) خاکی سپی؛ ۳) ناوی چیایەکــە لە کوردستــــان؛ ۴) ڕشــك، گەرای ئەسپێ؛ ۵) گۆشتی سنگی مەل؛ ۶) گۆشتی بەلەك، پوٌز؛ ۷) سپیایی ناو هێلکە، سپێنە؛ ۸) سپیایی دەوری ڕەشکێنــەی چاو، سپێنــەی چاو؛ ۹) گونــدێکی کوردستــانە بەعسی وێرانــی کرد [ف] ۱) اســب سفــید؛ ۲) خاك سفــید؛ ۳) نام کوهی در کردستــان؛ ۴) تخم شپش، رشــك؛ ۵) گوشت سینــهٔ پرنده؛ ۶) نرمهٔ ساق؛ ۷) سپــیدهٔ تخم‌مرغ؛ ۸) سپیدی چشم؛ ۹) از روستــاهـــای کردستان که بعثیان ویران کردند.

**سپیلکاپێ:** پێشەی ساق، لوٌلاك [ف] استخوان ساق.

**سپیلکە:** ۱) جۆرێ مازو؛ ۲) سپی واش [ف] ۱) نوعی مازوج؛ ۲) سفیدفام.

**سپیلکێ:** گونــدێکی کوردستــانە بەعسی وێرانی کرد [ف] از روستاهای کردستان که بعثیان ویران کردند.

**سپیلە:** سپیکەلە [ف] مایل به سفید.

**سپین:** تیغە، نێوان [ف] تیغه، فاصل، جداکننده.

**سپیناغ:** ئەسپەناغ، سپەناغ [ف] اسفناج.

**سپیندار:** سپیدار [ف] درخت تبریزی، سپیدار.

**سپێنە:** ۱) سپیلکی هێلکە؛ ۲) سپیلکی چاو [ف] ۱) سفیدهٔ تخم‌مرغ؛ ۲) سفیدی چشم.

**سپی‌واژ:** سبات، سپات [ف] رنگ کرم.

**سپی‌واش:** سپی‌واز، سپات [ف] رنگ کرم.

**سپیٚوٚن:** ئەسپیۆن [ف] شپشو.

**سپیوەنــد:** گونــدێکی کوردستــانە بەعسی کاولی کرد [ف] از روستاهای کردستان که بعثیان ویران کردند.

**سپی هەڵگەڕان:** ڕەنگ پێ‌نەمان [ف] رنگ باختن.

**ستا:** ئەستێ [ف] سنگ آتش‌زنه.

**ستار:** ۱) داپۆشین؛ ۲) ئارامی، ئۆقرە [ف] ۱) زیر پوشش قرار دادن؛ ۲) آرامش.

**ستارخانی:** جۆرێ کەوای پیاوانەی نیوقەد [ف] نوعی نیم‌تنهٔ مردانه.

**ستارکردن:** ۱) پۆشینی نهێنی؛ ۲) ئارام‌بوٌن، ئۆقرە گرتن [ف] ۱) پوشیدن و نهان‌داشتن؛ ۲) آرام گرفتن.

**ستارگرتن:** ئارام‌بوٌن [ف] آرام شدن.

**ستــارە:** ۱) ئەستێرەی عاسمان؛ ۲) دیوارۆکەی دەوری سەربان [ف] ۱) ستاره؛ ۲) نردهٔ آجری پیرامون بام.

**ستاڤ:** سایەی پەنا خۆرەتاو [ف] سایهٔ مجاور آفتاب.

**ستــان:** ۱) پاشگری بەواتا: جێگە، شوێن: (**دارستان، کوردستان**)؛ ۲) ئەستێن، وەرگر [ف] ۱) پسوند مکان؛ ۲) گیرنده.

**ستاندن:** ۱) وەرگرتن، ساندن؛ ۲) داگیر کردن بەزۆر [ف] ۱) گرفتن؛ ۲) غصب کردن.

**ستاندنەوە:** وەدەست خستنەوەی قەرز یان تۆڵە [ف] بازپس گرفتن.

**ستــانــگ:** ۱) زەردەواڵــە، زەرگەتە؛ ۲) ژەنگە سوٌرە؛ ۳) کەنگر [ف] ۱) زنبور زرد کوچك؛ ۲) زنبور درشت قرمز؛ ۳) کنگر.

**ستایشت:** مەحت، تاریف، پەسن [ف] ستایش.

**ستــر:** ۱) پەیژە، پەیجە، ناردیوان، سلەم؛ ۲) پۆشینی نهێنی: (سترم کە، خوا سترت بکا) [ف] ۱) نردبان؛ ۲) پوشیدن راز.

**ستران:** گۆرانی، قام، لاوك [ف] ترانه.

**ستران بێژ:** قام‌بێژ، دەنگ بێژ، گۆرانی بێژ [ف] ترانه‌خوان.

**ستــراندن:** ۱) گۆرانی گوتن، ئاواز خوەندن؛ ۲) شێلانی هەویر [ف] ۱) ترانه خواندن؛ ۲) چلاندن خمیر.

**سترانڤان:** ستران بێژ [ف] ترانه‌خوان.

**ستــرك:** ۱) بنکەچرێش، بنەچرێش؛ ۲) پەیژەی کورت [ف] ۱) پیاز گیاه سریش؛ ۲) نردبان کوتاه.

**سترۆ:** شاخی حەیوان، قۆچ [ف] شاخ حیوان.

**سترە:** جۆرێ کەوای کورتە لەسەر جلیقەوە دەیپۆشن، کۆت [ف] کت پوشیدنی.

**سترٚه:** سترۆ [ف] شاخ حیوان.

**سترهاندن:** شێلاندن [ف] چلاندن.

**سترٚەه:** سترۆ [ف] شاخ حیوان.

**ستری:** ۱) دڕك، چقل، دڕو؛ ۲) توٌترك، توٌدڕك [ف] ۱) خار؛ ۲) تمشك.

**ستــری بڕك:** داری دوحــاچەی دڕوٌ کۆ کردنەوە [ف] چوب دوشاخهٔ خار جمع کردن.

**ستری زەرك:** دڕوە زەردە. دەڵێن بۆدەرمان دەبێ [ف] زردخار.

**ستری شینْك:** وشترخۆرە [ف] خارشتر.

**ستری مشك:** بنەدرێکیە فا خاربُنی است.
**سترین:** شیلان فا چلاندن.
**ستڵ:** پەقرەج، دۆڵچەی کانزا فا سطل.
**ستك:** گیایەکە بەریکی خڕی بەتام دەگرێ، سێوەلۆکە فا گیاهی است با میوهٔ گرد خوردنی.
**ستو:** ۱) شایەتی؛ ۲) مل، گەردن، ئەستۆ فا ۱) گواهی؛ ۲) گردن.
**ستۆ:** ئەستۆ، مل فا گردن.
**ستۆبازن:** جانەوەرێکی خزۆکە فا خزنده‌ایست.
**ستۆپاریز:** ملپێچ فا شال گردن.
**ستوخوار:** زۆر بەرفەرمان، مل کەچ لەبەر دەستی مەزنی خۆی دا فا بسیار فرمانبردار.
**ستودان:** شایەتی‌دان فا گواهی دادن.
**ستوُر:** ئەستوُر، قەوی فا کلفت، ستبر.
**ستورك:** کولێرە، نانی گردو ئەستوُر فا گرده نان کلفت، ونانه.
**ستوُری:** ئەستوُری فا کلفتی، ضخامت.
**ستوُف:** شایەتی، ستو فا گواهی.
**ستوُفدان:** ستوُدان، شایەتی‌دان فا گواهی دادن.
**ستوُفەدان:** ستوُفدان، ستوُدان فا گواهی دادن.
**ستۆکڕك:** ئەستوکوڕك، سورێنچکە، کرکڕاگە فا سرخ نای، خرخره.
**ستۆکوڕ:** ستۆکڕك فا خرخره، سرخ نای.
**ستۆکوڕك:** ستۆکڕك فا خرخره، سرخ نای.
**ستوُن:** کۆڵەکە، ئەستون، ئەستوندەك فا ستون.
**ستوُناپشت:** موغەرەی پشت، مورکی‌پشت فا ستون فقرات.
**ستوُنە:** ئەستوُنە، ستوُن فا ستون.
**ستوُنی:** ئەستوندەکی، ڕاست وەك کۆڵەکە فا عمودی.
**ستە:** ۱) بەردی ئاگر پڕێن، ئەستێ؛ ۲) ئاسنێ کە لە بەردئەستێ دەدرێ فا ۱) سنگ آتش‌زنه؛ ۲) آهنی که بر سنگ آتش‌زنه زنند.
**ستەرك:** کورسی بۆ لەسەر نوسین، مێز فا میز تحریر، میز کار.
**ستەکان:** پیاڵەی شوُشە بۆ چای، ئیستیکان، ئیسکان فا استکان.
**ستەم:** ۱) حەستەم، دژوار؛ ۲) زوڵم، ناهەقی، گوُج فا ۱) دشوار؛ ۲) ستم.
**ستەمکار:** زاڵم فا ستمگر.
**ستەمگەر:** ستەمکار، زاڵم فا ستمگر.
**ستەنگ:** ۱) ستانگ، زەردەواڵە، زەرگەتە؛ ۲) ژەنگەسوُرە فا ۱) زنبور زرد کوچك، موسه؛ ۲) زنبور درشت قرمز.
**ستەو:** ستە فا نگا: ستە.
**ستەور:** ئەستێور، ئاژەڵێ کە ساڵێ زانی بواردبێ فا نگا: ئەستێور.
**ستەوری:** باژێڕێکە لای‌ماردین لە کوردستانی بەردەستی ترکان فا شهری است در کردستان ترکیه.
**ستەول:** پشتێر، گەوەڕ فا اصطبل.
**ستی:** ۱) ستە؛ ۲) ناوی ژنانەیە، ئەستی فا ۱) نگا: ستە؛ ۲) نام زنانه.
**ستێ:** ۱) ستە: ۲) خوشکی مێرد، دش فا ۱) نگا: ستە: ۲) خواهرشوهر.
**ستێر:** ۱) ئەستێرە؛ ۲) گوڵاوێ کە پێشی دەگرن. ئەستێرك فا ۱) ستاره؛ ۲) استخر.
**ستێڕ:** پێڕك، هەرزاڵ فا تلمبار، سکوی اثاث در سیاه چادر.
**ستێرپژیان:** ڕاخوشینی ئەستێرە فا نیازك.
**ستێڕك:** ستێڕە فا سکوی سیاه چادر.
**ستیرمە:** سرایت، گرتنەوە فا سرایت.
**ستێروك:** ئەستێروکە، گوڵ ئەستێرە، گوەستێرە فا کرم شبتاب.
**ستێرە:** ئەستێرە، ستارە، هەسارە فا ستاره.
**ستین:** تین، تاو، هێز، ورە، توانایی، تابشت فا نیرو، قدرت.
**ستێن:** ئەستێن، ستان فا گیرنده، غاصب.
**ستینك:** ئەستوندەك، کۆڵەکە فا ستون.
**ستینگ:** ستانگ، ستەنگ فا نگا: ستانگ.
**ستێور:** ئەستێور، ستەور فا نگا: ستەور.
**سج:** زج، قورنو فا نگا: زج.
**سجوق:** باسوخ، باسوق فا باسلق.
**سجە:** ڕەنگی سوری کاڵ: (**سجەمار**) فا قرمز روشن.
**سچ:** ۱) زج، سج؛ ۲) بنەمای سوچیان، سوتان فا ۱) نگا: زج؛ ۲) اصل کلمهٔ «سوچیان» سوز.
**سچاندن:** ئاگرتێ بەردان، سوتاندن، شەوتاندن فا سوزانیدن.
**سچانن:** سچاندن، سوتاندن فا سوزانیدن.
**سچق:** باسترمە، پاستورمە فا نگا: باسترمه.
**سچیا:** سوُتا، سوُزیا، ئاگری تێ بەربو فا سوخت، ماضی سوختن.
**سچیان:** سوُزان، ئاگرتێ بەربوُن، ئاگرتێ چوُن فا سوختن.
**سحا:** ۱) لە بەرەبەیاندا؛ ۲) ڕۆژی دوایی، سبحەی، سبحەینێ فا ۱) در بامداد؛ ۲) فردا.
**سحالە:** ئاردەبرنج فا آرد برنج.
**سخ:** ۱) تەنراوی زۆربەپۆی سفت؛ ۲) وشەیەکە لە بەرانبەر تخدا دەڵێن واتـا: بەقسەی تۆ نەبێ و لە کایەدا ژێر نەکەوم؛ ۳) چڕو پڕ: (مێشەکە سخ بو) فا ۱) سفت تنیده؛ ۲) کلمه‌ای در بازی شتالنگ؛ ۳) انبوه و پرپشت.
**سخار:** زەوینێ کە بۆکێڵان نابێ، نەکێڵ فا زمین غیرقابل کشت.
**سخان:** پێشە، هەستی، ئێسقان، ئێسك فا استخوان.
**سختیان:** چەرمی ئەستوُری لەدەباغ دراو فا ساغری، کیمخت.
**سخر:** زنج، ماڵی لەقامیش فا کوخ از نی.
**سخڕك:** زنجی پچکۆلە فا کلبه کوچك از نی.
**سخرە:** سخار فا زمین غیرقابل کشت.
**سخمە:** زوخمە، ئێلەك فا یلك.
**سخڵەت:** داماو، سەرگەردان، دودڵ فا درمانده.
**سخورمە:** بەمشت لێدان فا با مشت زدن.
**سخێف:** دژوُن، دژمان، جوێن، جنێو فا دشنام.
**سداب:** ئەسپەندەر فا سپند.

**سداره:** جۆرێ کڵاو ف نوعی کلاه.

**سدان:** ١) دەزگای پینەچیو ئاسنگەر؛ ٢) خەڕات، کەسێ قاپو ئامانی داری دروست دەکا ف ١) ابزار آهنگر و پینەدوز؛ ٢) خرّاط.

**سده:** رایەڵ، ئەورێزه بەنەی پۆی تیۆه دەدرێ ف تارهای بافتنی، مقابل پود.

**سدێ کرن:** رایەڵ کردن ف تارهای بافتنی را مرتب کردن.

**سر:** بای هێدیو له سەرخۆ، سروه، شنه، شیبا ف نسیم.

**سڕ:** ١) بای سارد؛ ٢) گۆفك، سەرانگوێلگ، جێ کۆی پەین؛ ٣) تەزیو؛ ٤) نهێنی، راز؛ ٥) چالاکیو بزاو، تونـدو تۆڵی: (تـه پیر بـوی سڕاته قەمری) ف ١) باد سرد؛ ٢) جای تودهٔ سرگین؛ ٣) کرخیده؛ ٤) راز؛ ٥) توان و تحرك.

**سڕبری:** سەرمابردو ف سرمازده.

**سڕ بڕی:** سەرمای زۆر توند ف سرمای شدید.

**سڕبون:** تەزین ف کرخیدن.

**سرپ:** کانگای قەڵایی ف فلز سُرب.

**سرپاندن:** سرتەکردن، سرکاندن، چپه کردن ف پچ‌پچ کردن.

**سرپه:** پچه، چپه ف نجوا، درگوشی.

**سرپەسرپ:** چپەچپ، پچەپچ ف درگوشی، پچ‌پچ.

**سرت:** ١) دڕك، چقـل؛ ٢) رەق، سەخت؛ ٣) زبـر؛ ٤) ئەركو ئازار؛ ٥) نەداریو دەستـەنگی؛ ٦) بەڵاو بەسـەرهـاتی ناخۆش؛ ٧) بەرزەفڕ، چاوله بەرزی؛ ٨) چپەچپ؛ ٩) چیای رژدو سەخت، هەڵەموت، هەزار بەهەزار ف ١) خار؛ ٢) سفت و سخت؛ ٣) خشن؛ ٤) درد و رنج؛ ٥) بینوایی؛ ٦) مصائب؛ ٧) بلندپرواز؛ ٨) پچ‌پچ، درگوشی؛ ٩) کوه بسیار سخت و مرتفع.

**سرتغ:** لاسار، سەرسەخت ف لجوج، یکدنده.

**سرتوخورت:** پچەپچ ف پچ‌پچ.

**سرته:** چپه، پچ، پچه ف حرف در گوشی، پچ‌پچ.

**سرتەسرت:** چپەچپ ف پچ‌پچ.

**سرتی:** ١) چونـەپێشی ئازایانه، بوێری؛ ٢) چەموشی؛ ٣) دڵڕەقی؛ ٤) توندو تیژی؛ ٥) لەمپەرو بەرگر ف ١) تهوّر، جسارت؛ ٢) چموشی؛ ٣) سنگدلی؛ ٤) شدّت؛ ٥) مانع.

**سڕد:** ١) تازه گوڵی خەله؛ ٢) ڕەوەك ف ١) خوشهٔ نودمیدهٔ غلّه؛ ٢) رموك.

**سڕدین:** ١) تازه وەگوڵهاتنی خەلـه؛ ٢) رەوینـەوه ف ١) نو بـردمیدن خوشهٔ غلّه؛ ٢) رمیدن.

**سرسـوم:** کوپـەی زلی سەرقاپ‌دار بۆ ژاندنی ماست، نێرەی گڵین ف نوعی خم سرپوش‌دار.

**سرشت:** خۆکرد، خۆرست ف طبیعت.

**سرشتی:** خۆرسکاو ف طبیعی.

**سرشك:** ئەسر، ئەسرین، رۆندك، ئەشك ف اشك.

**سرف:** تەنها، هەربۆ ف صِرف، محض، فقط.

**سرق:** گیایەکی دەسچێنه له چەوەندەر دەکا، سڵق ف گیاهی از تیرهٔ چغندر.

**سرك:** قوشقی، رەوەك ف رموك، هیدخ.

**سرکاسن:** دەرمانی چەرم رەنگ کردن ف داروی رنگ کردن چرم.

**سرکاندن:** چپەکردن ف زیرلبی حرف زدن.

**سرکاتن:** سرکاندن ف زیرلبی حرف زدن.

**سڕکردن:** تەزاندن ف کرخانیدن.

**سرکوهۆڕ:** سرتەسرتی زۆر ف زیاد در گوشی حرف زدن.

**سرکه:** ١) سرته؛ ٢) ترشاوی کۆنی میوه ف ١) حرف زیرلبی؛ ٢) سرکه.

**سرکەسرك:** سرتەسرت ف نگا: سرتەسرت.

**سڕکەوان:** سەرەنوێلك، جێگەی پەینو پاڵ ف جای ریختن سرگین.

**سرکـەیی:** جۆرێ پارچـەی ئاوریشمی تەنکـه ژنـان بەسـەر خۆیانی دادەدەن، هەوری ف پارچهٔ کلاغی.

**سرگ:** سرك ف رموك.

**سرگون:** دورخرانەوه ف تبعید.

**سرمه:** گەردانه له زێڕ یان مراوری ف گردنبند طلایی یا مروارید.

**سڕمەسڕم:** هەراهەراو غەڵبەغەڵب ف همهمه و جنجال.

**سرمیچ:** میچ، سەقف ف سقف.

**سڕنا:** زوڕنا ف سرنا.

**سڕناتك:** زوڕناتك، گیایەکه بۆ دەرمان دەشێ ف گیاهی است دارویی.

**سڕناژەن:** زوڕناچی ف سرنانواز.

**سرنج:** وردبونەوه، بیرلێ کردنەوه ف دقّت.

**سرنج‌دان:** به وردی لێ‌ڕوانین ف دقّت کردن.

**سرنجك:** بەسەرهاتێ له خەودا که پشو له نوستو دەبڕی، موته، موتەکه ف کابوس.

**سرنجه:** زیخو رەڵمی لێك دراو ف شن و ماسهٔ مخلوط.

**سرنجیانه:** ناوی گوندێکه لەلای سنه ف نام دهی است.

**سرنگ:** دەرزی دەرمان دەلەش کردن، شرینقه، ئاودوزەك ف سرنگ.

**سرنگا:** بالگه، باڵشت ف بالش.

**سڕنی:** عەڕابەی کەڵان، عەرەبانەیەك که دوکەڵ دەیان کێشا ف ارادەای که گاوان می‌کشند.

**سرو:** له دوای وشەی چەقه دێت واتا: بێژ: (کابرا چەقەسروێه) ف بعد از کلمهٔ «چەقه» بەمعنی گوینده.

**سروت:** لاسکی گەنمو جۆ، کلۆش، ساقەتەی دەخڵ ف ساقهٔ گندم و جو.

**سروچـك:** گونـدێکی کوردستـانـه بەعسی وێرانی کرد ف از آبادیهای کردستان که بعثیان ویران کردند.

**سرود:** گۆرانی نیشتمانی، نەشید ف ترانهٔ ملّی، سرود.

**سروش:** فرشتەی پەیام‌بەر، جبرائیل ف جبرئیل.

**سروشت:** سرشت ف طبیعت.

**سروشتی:** سرشتی ف طبیعی.

**سروه:** بای بسکان، شنەبا، شنه، کزەبا ف نسیم، ایاز.

**سره:** نۆبه، نۆره، باو ف نوبت.

**سڕه:** ١) باگر؛ ٢) بای سارد؛ ٣) ریخو شیاکەی پەستاوتەی وشك، کەمره؛

۴) شه‌خته‌ی پایز ف ۱) باد راه؛ ۲) باد سرد؛ ۳) سرگین لگدمال شدهٔ خشك و سفت؛ ۴) سرمای نابهنگام پائیز.

**سره‌فت:** ئۆقره، ئارام، داسه‌کنان ف آرامش تن.

**سره‌فتن:** ئۆقره گرتن، هه‌دادان ف آرام شدن.

**سره‌وان:** ۱) سره‌فتن؛ ۲) لێدان، بڕوانه تێ سره‌واندن ف ۱) آرام شدن؛ ۲) زدن.

**سره‌واندن:** ۱) ئارام کردن؛ ۲) تێ سره‌واندن ف ۱) آرام کردن؛ ۲) زدن.

**سره‌وانن:** سره‌واندن ف نگا: سره‌واندن.

**سره‌وت:** سره‌فت ف آرامش تن.

**سره‌وت کردن:** ئارام کردن ف آرام کردن.

**سره‌وت گرتن:** ئارام بوُن، ئۆقره گرتن ف آرام گرفتن.

**سره‌وتن:** سره‌فتن ف آرام شدن.

**سره‌وین:** سره‌وان ف نگا: سره‌وان.

**سڕی:** ۱) ته‌زین؛ ۲) ئه‌سترِی، مالّیه‌وه ف ۱) بی‌حسّی؛ ۲) زدود، پاك کرد.

**سرێش:** چرێش، ئه‌سرێلك، سترك ف سریش.

**سرێشله‌مه:** کاری ناته‌واو ف کار ناتمام.

**سرێشمه:** ۱) سرێشه‌جاڕ؛ ۲) ناوی گوندێکه له کوردستان ف ۱) سریش زار؛ ۲) نام دهی در کردستان.

**سریلاوا:** ناوی گوندێکه له کوردستانی موکری ف نام دهی.

**سریله:** ۱) مه‌لێکی پچوُکی جوانه دو په‌ڕی وه‌ك دوشاخ لێ به‌رز بۆته‌وه؛ ۲) جانه‌وه‌رێکی پچوکی وه‌ك کولله‌یه جیره‌جیر ده‌کا، سیسرك ف ۱) چکاوك؛ ۲) جیرجیرك.

**سڕیمه:** تاسیر، ژانی به‌هۆی برینداربون‌و... ف تأثیر، درد در اثر زخم و...

**سڕین:** ئه‌سترِین ف زدودن، پاك کردن.

**سرینچك:** به‌ری دارێکی دڕکاوی گه‌لابۆری زه‌یتونیه تێکولّی سوُره له‌ناوه‌وه وه‌ك ئارد ده‌چێ، سنجو، لاسی ده‌سچێن ف سنجد.

**سرینچکه‌تالّه:** جۆرێ سرینچك ف نوعی سنجد تلخ.

**سڕینه‌وه:** ۱) ئه‌سترِینه‌وه، بردنی په‌لّه یان خه‌ت؛ ۲) خاوێن کردنه‌وه به په‌ڕۆو... ف ۱) ستردن، زدودن؛ ۲) پاك کردن با دستمال و...

**سریوه:** ۱) سروه، شنه، بای بسکان؛ ۲) جریوه‌ی چۆله‌کان؛ ۳) زریوه‌ی ئه‌ستێره ف ۱) نسیم؛ ۲) جیك‌جیك گنجشکان؛ ۳) چشمك ستاره.

**سزا:** ۱) پاداشت؛ ۲) ده‌ردو ئازار؛ جزیا ف ۱) پاداش؛ ۲) رنج و آزار.

**سزاچه‌شتن:** توُشی ره‌نج‌و ئازار بوُن ف درد چشیدن.

**سزاچه‌شین:** سزاچه‌شتن ف درد چشیدن.

**سزاچێشتن:** سزاچه‌شتن ف دردچشیدن.

**سزاخانه:** جێگه‌ی ئازاردان ف شکنجه‌گاه.

**سزاخواردن:** توُشی ئازاربوُن ف آزار چشیدن.

**سزادان:** ۱) پاداشت دانه‌وه؛ ۲) ئازاردان ف ۱) پاداش دادن؛ ۲) آزردن.

**سزادانه‌وه:** ۱) تۆلّه‌بۆکردنه‌وه؛ ۲) تۆلّه لێ سه‌ندنه‌وه ف ۱) جبران کردن؛ ۲) انتقام گرفتن.

**سزاو:** ئاوی له ماستی ناو توُره‌که تکاو ف آبی که از ماست کیسه آید.

**سزْك:** ۱) ئاوی په‌نیر که لۆرکی لێ ده‌گرن؛ ۲) تیژاوی دۆ که ده‌کرێته شیرێژ ف ۱) آب پنیر که لور سازند؛ ۲) تیزاب دوغ که شیراز سازند.

**سزگ:** سزك ف نگا: سزك.

**سزه:** ته‌زوُی سه‌رما ف سوز سرما.

**سژ:** زج، زچ، سج، قڕنو ف نگا: زج.

**سس:** شل‌و ول، خۆنه‌گرتو ف سُست.

**سسارك:** سیسارگ ف کَرکَس.

**سست:** سس ف سُست.

**سست‌وپه‌له‌شت:** ته‌مه‌ڵ‌و له‌کارنه‌زان ف تنبل و بی‌مهارت در کار.

**سسته‌په‌له:** ته‌مه‌ڵ له کارو لێ نه‌زان ف دستپاچه و تنبل.

**سسته‌سست:** خۆبواردن له کار ف اهمال کردن در کار.

**سسته‌ك:** زه‌وی شلی ناپته‌و ف زمین سست و نامحکم.

**سستی:** شل‌و شه‌وێقی، ته‌مه‌لّی، له‌ش گرانی ف سستی.

**سسلّه:** زنجیرۆکه‌ی زه‌نبه‌ر ف زنجیر زینتی.

**سسه:** سسته‌ك ف نگا: سسته‌ك.

**سسێ:** ژماره سێ ف عدد سه.

**سسی:** دانۆکه که‌نگر ف کنگردانه.

**سعوُتی:** بڕنوتی ف انفیه.

**سعوُد:** به‌خت، تالّه، تالح ف بخت.

**سغ:** سخ ف نگا: سخ.

**سفارشت:** ڕاسپاردن ف سفارش.

**سفت:** سخ ف سفت تنیده.

**سفتاح:** هه‌وه‌ڵ فرۆش، ده‌شت ف استفتاح، دستفال، دشت.

**سفت‌بوُن:** سخ‌بوُن ف سفت شدن.

**سفتۆ:** بۆگه‌ن ف بدبو.

**سفتۆبوُن:** داهێزان، له‌ش گران بوُن، نیوه نه‌خۆش ف کِسِل.

**سفت‌وساده:** بێ ڕوُده‌روایسی، ره‌پ و ڕه‌وان ف رك و صریح.

**سفتوسۆ:** چوزانه‌وه‌ی برین ف سوزش زخم.

**سفتۆك:** میوه‌ی گه‌نیوی رزیو ف میوهٔ گندیده.

**سفت‌وسوّل:** سخی ساف‌و لوُس ف سفت و صاف.

**سفت‌وسوێ:** سفت‌وسۆ، چوُزانه‌وه، توُزانه‌وه ف سوزش زخم.

**سفته:** ۱) ساویاو، حولی‌بوُگ؛ ۲) ڕیایی، روبینی؛ ۳) پسوُله‌ی حه‌والّه؛ ۴) گیایه‌که بۆ مالّات؛ ۵) سوُتاو ف ۱) ساییدهٔ صاف شده؛ ۲) تملّق؛ ۳) سفته؛ ۴) علفی است؛ ۵) سوخته.

**سفته‌ك:** دارێکه به‌رێکی شیرین ده‌داو گه‌لّای له گه‌لّای زه‌یتون ده‌کا ف درختی است جنگلی.

**سفتی:** توندی ته‌نراو ف سفتی بافت.

**سفتیك:** ده‌شتایی له نێوان کێوان ف جلگه در دره، وادی.

**سفر:** نوخته له نوُسینی ژماره‌دا، نوخته‌ی به‌تالّایی ف صفر.

**سفره:** که‌وڵی نان، خوان ف سفره.

**سفره‌بڕ:** سیسرکی مالّی، سیسرکه ف جیرجیرك.

**سفره‌بڕه:** سفره‌بڕ ف جیرجیرك.

**سفره‌چی:** خزمه‌تکارێ که به نان‌و خوان ڕاده‌گا ف گارسن.

**سفره‌مار:** ره‌قه‌مار، جۆرێ ماره ده‌ڵێن ورگی ئاواڵه ده‌کاته‌وه مێش‌و مۆزی لێ ده‌نیشتن‌و له‌پڕ ورگی وێك دێته‌وه به‌وه ده‌ژی ف نوعی مار که گفته می‌شود شکمش باز می‌شود.

**سفره‌ی فه‌قێ‌یان:** هه‌شت ئه‌ستێره‌ن له نێوان برجی دوپشك‌و ته‌رازودا ف هشت ستاره در میان برج عقرب و میزان.

**سفره‌ی فه‌قیران:** سفره‌ی فه‌قێ‌یان ف نگا: سفره‌ی فه‌قێ‌یان.

**سفری:** ئه‌ستێ‌و به‌ردی تفه‌نگی ڕاو ف سنگ آتش‌زنهٔ تفنگ سر پر.

**سفـــك:** ۱) به‌رهـــه‌یوان؛ ۲) سوُك، دژی گران‌و سه‌نگین؛ ۳) کۆست، له‌مپه‌ر، بڵندایی سه‌ره‌ڕێگه ف ۱) ایوان خانه؛ ۲) سبُك؛ ۳) مانع در راه.

**سفکی:** دژی قورسی‌و سه‌نگینی ف سبُکی.

**سفکێ:** ناوی گوندێکه له کوردستان ف نام روستایی است.

**سفلیس:** نه‌خۆشیه‌که شه‌رمی نێر و مێ داده‌گرێ ف سفلیس.

**سفن:** ماك، بنه‌ما، ره‌گ‌و ریشه ف اصل، بیخ و بن.

**سفنـك:** هیم، خیم، ته‌مه‌لـه، به‌ردی بناخه، بناغه ف اسـاس بنای ساختمان.

**سفنێ:** ناوی گوندێکه ف نام دهی است.

**سفـور:** ۱) گه‌سك ده‌ری کۆڵان؛ ۲) ژنه شارستانی بێ ڕوپۆش ف ۱) رفتگر؛ ۲) زن شهری بی‌حجاب.

**سفۆر:** جانه‌وه‌رێکه که‌وڵی به‌قیمه‌ته، سمۆره ف سمور.

**سفۆری:** بالاپۆش له که‌وڵی سمۆره ف جبّه از پوست سمور.

**سفـه‌ت:** ۱) په‌سن، تاریف؛ ۲) ئه‌مـه‌گ، وه‌فا: (زۆر بێ **سفه‌ته**) ف ۱) وصف؛ ۲) وفا.

**سفی:** سپی، چه‌رمگ ف سفید.

**سفێده:** سپێده، به‌ره‌به‌یان ف بامداد، پگاه.

**سڤ:** په‌رسڤ، جواو ف پاسخ.

**سڤانده:** سوانده ف لب بام.

**سڤانك:** گیایه‌که عه‌ره‌ب پێی ئێژن گونه‌ڕێوی ف گیاهی است.

**سڤده:** سه‌رده‌رانه به خشت هه‌ڵچنین ف نردهٔ آجری بالای در.

**سڤ سڤیلك:** مه‌لێکی پچوکی ره‌نگاوره‌نگه ف گنجشکسانی رنگارنگ.

**سڤك:** نه‌سه‌نگین، سفك ف سبك، کم‌وزن.

**سڤکۆك:** زۆرسڤك ف بسیار سبك.

**سڤنك:** گه‌سك ف جارو.

**سڤنـگ:** چنگـه‌کلۆشێ که پشتی گاگێره‌ی پێ ده‌ماڵن ف دسته‌ای از ساقهٔ غلّه که پشت گاو خرمنکوب را بدان تمیز کنند.

**سڤۆره:** سمۆره، سفۆر ف سمور.

**سڤۆری:** جلکی له که‌وڵی سڤۆره ف لباس از پوست سمور.

**سڤوُك:** توتم، ترشی سماق ف سماق.

**سڤی:** سەر هێڵه‌گ، که‌په‌ك ف نخاله.

**سڤێری:** گیایه‌که له جۆ ده‌کا ف گیاهی جومانند.

**سڤیشك:** دودڵی، دڕدۆنگی ف بدگمانی.

**سڤیك:** ۱) میچ، بان له دیوی ژوُره‌وه؛ ۲) به‌رهـه‌یوانـۆکه؛ ۳) گه‌سك، گزگ ف ۱) سقف؛ ۲) تراس کوچك؛ ۳) جارو.

**سڤیل:** که‌سێ که جلکی ئوروپـایی له‌بـه‌ردابێ ف کسی که پوشاکش اروپایی است.

**سڤیلانْك:** زۆر سڤك ف بسیار سبك‌وزن.

**سقـــان:** ۱) پێشـه، ئێسـك، ئێسقـان، سخـان، هه‌ستی: ۲) تیژکـردن‌و سوُنه‌وه‌ی تیخ ف ۱) استخوان؛ ۲) تیز کردن تیغ.

**سق سق:** جیڕه‌جـیڕ. بۆ ده‌نـگی ده‌رگای شڕو که‌وشی *تازه ده‌ڵێن* ف صدای در کهنه و کفش تازه.

**سقڵ:** نه‌خۆشی خواردن نه‌تواندنه‌وه، گرفت، ئینته‌لا ف بیماری امتلا، رودل.

**سقمه:** ژنی تێرگۆشتی له‌بار ف زن چاق و خوش‌تیپ.

**سقێف:** سخێف، جوێن، دژوُن، دژمان ف دشنام.

**سك:** ۱) زگ، ورگ‌وناو؛ ۲) پیزه، تۆل؛ ۳) ناحه‌ز، ناشیرین ف ۱) شکم؛ ۲) جنین؛ ۳) نازیبا، زشت.

**سکاسن:** ده‌رمانی چه‌رم ره‌نگ کردن ف داروی رنگ چرم.

**سکـالا:** ۱) وتـو وێژی خۆشـه‌ویستانه، رازو نیاز؛ ۲) گله‌یی، لۆمه؛ ۳) شکایه‌ت، گله؛ ۴) بیری چاره ف ۱) رازو نیاز؛ ۲) گله؛ ۳) شکایت؛ ۴) چاره‌جویی.

**سکـالـه:** ۱) شکـات، شکایه‌ت، داد؛ ۲) پاڕانه‌وه ف ۱) شکایت؛ ۲) التماس، لابه.

**سکان:** ۱) چه‌سپین، لکان؛ ۲) جنێو، دژمان ف ۱) چسبیدن؛ ۲) دشنام.

**سکـانْن:** ۱) چه‌سپاندن، لکاندن: ۲) جوێن‌دان ف ۱) چسبانیدن: ۲) دشنام دادن.

**سك‌به‌ردان:** زگ به‌ردان ف کنایه از پرخوری.

**سکپ:** بن‌ڕێسمه ف چوب پاشنهٔ در.

**سکپڕ:** زکپڕ ف حامله.

**سکتـان:** گونـدێکی کوردستـانه به‌عسی وێرانی کرد ف از روستاهای کردستان که بعثیان ویران کردند.

**سکتر:** بێده‌نگ له ناچاری: (**سکتر به** واتا: بێده‌نگ به) ف خاموشی از ناچاری، خفه‌شدن.

**سکچوُن:** زگچوُن ف اسهال.

**سکدار:** ئاوس، زگدار ف آبستن.

**سکدڕاو:** زگدڕاو ف کنایه از پرخور.

**سکر:** ۱) پالوێنه‌ی له تۆڵ چندراو؛ ۲) به‌ربه‌ندی ئاو به تۆڵ‌و گیا ف ۱) پالونهٔ از ترکه؛ ۲) سدّ آب از ترکه و گیاه.

**سکرۆین:** زگچوُن ف اسهال.

**سکزل:** زگزل ف شکم گنده.

**سك‌سوُتان:** زگسوُتان ف کنایه از مرگ فر زند.

**سکف:** سکپ ف نگا: سکپ.

**سك کردن:** زگ کردن ف نگا: زگ کردن.

**سککـه:** ۱) گوڵمیخ؛ ۲) سکـه، پاره‌ی له کانـزا، قه‌ره‌پوڵ ف ۱) میخ

طویله؛ ۲) سکّه، پول فلزّی.

**سکڵ:** پۆلو، پۆل، پەنگر، پەرەنگ، پەن، پن ف اخگر.

**سکڵ فوُ:** گەمەیەکە سکڵ بە دەرزیو بەنێکەوە هەڵداوەسنو بەرەو یەکتر فوی لێ دەکەن. سکڵی بەفوان ف نوعی بازی با اخگر.

**سك لەوەڕێن:** زگ لەوەڕێن ف سورچران.

**سکڵی بەفوان:** سکڵ فوُ ف نگا: سکڵ فوُ.

**سکماك:** زگماك ف مادرزاد.

**سکن:** زگن، زگزل ف شکمو، شکم گنده.

**سك‌نانەسەر:** زگ‌نانەسەر ف کنایه از پرخوری.

**سکور:** ستۆکرۆك، سورێنچکە ف خرخره، سرخ‌نای.

**سکورد:** ستۆکرۆك ف خرخره.

**سك‌وزا:** زگ‌وزا ف زادو ولد.

**سکوزان:** سکوزا، زگوزا ف زادو ولد.

**سکوم:** تەرحو دیدار، سەرو سەکوت ف سیما.

**سکـە:** ۱) سکـوم؛ ۲) یارە، لەسکەدراو، زێڕ یان زێوی دەقالب کراوی نوسراو ف ۱) سیما؛ ۲) سکّه.

**سکەشۆرە:** زگچوُن ف اسهال.

**سکەشۆرێ:** زگچوُن ف اسهال.

**سکەڵ:** سکڵ ف اخگر.

**سکەنجەبین:** ئەسکەنجەبین، ئەسکەنجەمین ف سکنجبین.

**سکەنجەمین:** ئەسکەنجەبین ف سکنجبین.

**سکێشە:** زگ‌ئێشە ف شکم‌درد.

**سگار:** جگەرە ف سیگار.

**سگڵ:** بالوُك، بالوُکە ف زگیل.

**سگوڕ:** گوێلکی زۆر قەڵەوی غلوُر ف گوسالۀ چاق و مغرور.

**سگین:** گانی سەگ، جوت‌بوُنی سەگی گۆڵو دێڵ ف جفت‌گیری سگ.

**سل:** ۱) تەپەگوُ؛ ۲) دەردە باریکە؛ ۳) توُڕەو قەڵس ف ۱) یك تکه مدفوع؛ ۲) بیماری سل؛ ۳) خشمناك.

**سڵ:** سرك، رەوەك ف رموك.

**سڵا:** بەرزاییان، بڵندان ف بلندیها.

**سلاح:** ۱) چەك، ئەسپـابی شەڕ؛ ۲) سوکـەڵەناوی سەلاحەدین ف ۱) جنگ‌افزار، سلاح؛ ۲) مخفف نام صلاح‌الدّین.

**سلار:** تخێل، راست بەعەرزا درێژبوُگ ف دراز کشیده بر زمین.

**سلاربوُن:** تخێل‌بوُن ف راست دراز کشیدن.

**سلاربـوُنـەوە:** ۱) تخێل‌بوُن؛ ۲) برێتی لە مردن ف ۱) دراز بر زمین افتادن؛ ۲) کنایه از مردن.

**سڵاڤ:** وشەی دۆست بە دۆست لە کاتی توُش‌بوندا ف درود، سلام.

**سڵام:** سڵاڤ ف سلام.

**سڵامالێ:** سڵاڤ، سەلام مەلێك ف سلام علیکم.

**سڵامانە:** دیاری لە سەفەر هێنان ف رەآورد سفر، ارمغان.

**سڵامەت:** ساق، ساخ ف سلامت.

**سڵامەتی:** ساقی، ساخی، ساغی ف سلامتی.

**سڵامەلێ:** سڵامالێ، سڵاڤ ف سلام علیکم.

**سڵامەلێك:** سڵاڤ، سڵامالێ ف سلام علیکم.

**سڵان:** سڵا، کێوان، بڵندیان ف بلندیها، کوهساران.

**سڵاو:** ۱) سڵاڤ؛ ۲) پارسەنگی تەرازو ف ۱) سلام؛ ۲) پارسنگ ترازو.

**سڵاوات:** پەسنی پێغەمبەردان بە دەنگی بەرز ف صلوات بر پیغمبر.

**سڵاودانـەوە:** ۱) تۆزێك گران‌کێشـانی تەرازو بۆ دڵخۆشی کڕیار؛ ۲) وشەی قوتاربونی نوێژ ف ۱) خاطرانه کمی گران کشیدن ترازو؛ ۲) سلام پایان نماز.

**سڵاوەت:** سڵاوات ف صلوات بر پیغمبر.

**سڵاوەتە:** ناوی گوندێکە ف نام دهی است.

**سڵبوُن:** ۱) قوت‌بوُن، سرك‌بوُن؛ ۲) توُڕەبوُن، قەڵس‌بوُن ف ۱) ئامادۀ رم شدن؛ ۲) خشمگین شدن.

**سلبین:** سڵبوُن، توُرەبوُن ف خشمگین شدن.

**سڵپ:** ۱) تڵف، تڵتە، تڵپ؛ ۲) تەپ، تەوەزەل ف ۱) تفاله؛ ۲) سست و تنبل.

**سڵتان:** سولتان، سان ف سلطان.

**سڵتان‌سەر:** تەیلەسەر ف تارك.

**سلتێنی:** زەوی بەشیَ دوروۆژە جوُت ف زمین به‌اندازۀ دو روز شخم زدن با گاو.

**سلخە:** ۱) ڕنو، کڵێڵە، ڕنی؛ ۲) گاشەبەردی زل ف ۱) بهمن؛ ۲) صخرۀ بزرگ.

**سلسار:** بێ‌شەرم، سەرسەری ف بی‌شرم.

**سلساردبوُنەوە:** برێتی لە مردنی ناخۆشەویست ف کنایه از مرگ بدسگال.

**سلسارد کردنەوە:** برێتی لە کوشتنی ناخۆشەویست ف کنایه از کشتن دشمن.

**سڵسڵە:** سسڵە ف زنجیر زینتی.

**سلسەردبوُنەوە:** سلساردبوُنەوە ف کنایه از مرگ بدسگال.

**سلسەردەوبوُن:** سلساردبوُنەوە ف کنایه از مرگ بدسگال.

**سلف:** سڵپ، تڵپ ف تفاله.

**سڵق:** سرق ف نگا: سرق.

**سڵقاو:** شێوی سڵق ف آش «سرق».

**سڵقی ڕوُت:** برێتی لە روُت‌و نەداری بێ هیچ شت: (چـەند ساڵە هەوڵ ئەدەیت‌و گەلـێ **روُت تری لە سڵق**) «شێخ رەزا» ف کنـایه از لات آسمان جل.

**سلك:** ۱) سرك، رەوەك؛ ۲) سڵق، سرق ف ۱) رموك؛ ۲) نگا: سرق.

**سلکاندن:** دورەپەرێزی لە خەڵك ف انزوا.

**سڵ کردن:** ۱) رەوینەوە؛ ۲) شەرم کردن لە روی خەڵکا ف ۱) رمیدن؛ ۲) خجالت کشیدن.

**سلکیان:** سڵ کردن، رەوینەوە ف رمیدن.

**سلکێ سۆر:** چەوەندەری خۆماڵی ف چغندر.

**سلکین:** سلکیان ف رمیدن.

**سلم:** ڕەو، قوشقی بوُن [ف] رم.
**سلّماس:** ناوچەو شارێکە لە کوردستان[ف] ناحیە و شهری در کردستان.
**سلماستك:** گیایەکە [ف] گیاهی است.
**سلمته:** بژار [ف] وجین.
**سلمو:** ڕەوەك [ف] رموك.
**سلۆ:** سوکەڵە ناوی سلێمان [ف] مخفف سلیمان.
**سلۆری:** گڕی ئاگر، پێت [ف] گُر آتش.
**سلۆقان:** هۆزێکی کوردە [ف] عشیرتی از کُردزبانان.
**سلۆم:** هۆزێکی کوردە [ف] عشیرتی از کردزبانان.
**سلوُهی:** سلتینی [ف] نگا: سلتینی.
**سلەم:** پەیژە، پەیجە [ف] نردبان.
**سڵەمـان:** ۱) ڕەوکردن؛ ۲) سوکەڵە ناوی سولەیمان [ف] ۱) رمیدن؛ ۲) مخفّف سلیمان.
**سڵەمانەوە:** ڕەوینەوە [ف] رم کردن.
**سڵەمکە:** گیایەکە لە دوکلێو ی دەکەن [ف] گیاهی است خوراکی.
**سڵەمە:** ڕەو [ف] رم.
**سلەمەڕ:** چەند پشکەڵی تەڕی پێکەوە نوُساوی مەڕ [ف] چند پشکل بهم چسبیده و خیس گوسفند.
**سڵەمیانەوە:** ڕەوینەوە [ف] رم کردن.
**سڵەمینەوە:** ڕەوینەوە [ف] رم کردن.
**سلەوجە:** نەخۆشیەکە بۆ بەز [ف] نوعی بماری گوسفند.
**سلەوجێ:** سلەوجە [ف] نگا: سلەوجە.
**سلی:** ۱) ڕەوەکیەتی؛ ۲) توُڕەیی، قەڵسی [ف] ۱) رمیدگی؛ ۲) خشم.
**سڵی:** ڕەوەکیەتی [ف] رمیدگی.
**سلێمان:** ناوە بۆ پیاوان [ف] سلیمان، نام مردانه.
**سلێمان کەندی:** ناوی گوندێکە لە کوردستان [ف] نام روستایی است.
**سلێمـانی:** ۱) جۆرێ موروُی ژنـانـە؛ ۲) جۆرێ ترێ؛ ۳) شارێکە لە کوردستـان [ف] ۱) نوعی مهرهٔ زینتی؛ ۲) نوعی انگور؛ ۳) شهری است در کردستان.
**سڵێمانی:** ۱) موروُی سلێمانی؛ ۲) نازناوی پەپوە: (پەپوسڵێمانی) [ف] ۱) نوعی مهرهٔ زینتی؛ ۲) لقب هدهد.
**سم:** ۱) سەرپەڕی ڕەقی پەلی ئاژەڵو وڵاخە بەرزە؛ ۲) پاشگری بەواتا: کونکەر [ف] ۱) سم چهارپا؛ ۲) پسوند بەمعنی سوراخ کننده.
**سما:** کونکرا [ف] سوراخ شد.
**سمات:** کەمرە، گەمڕە [ف] سرگین سفت لگدمال شده.
**سمـاتـە:** ۱) بەردێکی ڕەشی زبر و زۆر سەختە؛ ۲) قاقەزێکی زبرکراوە ئاسنو داری پێ لوُس دەکەن [ف] ۱) سنگی سیاه و سخت؛ ۲) سنباده.
**سماخ:** ئاودانی تیخ [ف] آب دادن تیغ.
**سماخکری:** تیخی ئاودراو [ف] تیغ آبدیده.
**سمـارتـە:** ۱) سمـاتـە؛ ۲) سمتـاش، ئامـرازی سم تاشین بە دەست ناڵبەندەوە [ف] ۱) سنباده؛ ۲) سمتراش.
**سماق:** توتم [ف] سماق.
**سماقان:** ۱) شوێنێ کە زۆری دارسماق لێ ڕواوە؛ ۲) ناوی گوندێکە لە کوردستان [ف] ۱) سماقزار، محل رویش سماق؛ ۲) نام دهی در کردستان.
**سماقاو:** چێشتی سماق، مزراویلکە، جل بڕۆکە [ف] آش سماق.
**سماق پالاّن:** پاڵوێنەی کانزا بۆ پاڵاوتنی برنج، سوُزمە [ف] پالونهٔ فلزّی، برنج پالا، شیپ پالا، آبکش.
**سماق دەرێنان:** برێتی لە جەزرەبەدانی زۆر [ف] کنایە از آزار دادن بسیار.
**سماق شیرنی بچوُك:** گوندێك لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد [ف] روستایی در کردستان کە بعثیان ویران کردند.
**سماق شیرنی گەورە:** گوندێك لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد [ف] روستایی در کردستان کە بعثیان ویران کردند.
**سمـاقلوُ:** گونـدێك لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد [ف] روستایی در کردستان کە بعثیان ویران کردند.
**سمـاقـوڵی سەرچاوە:** گوندێك لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد [ف] روستایی در کردستان کە بعثیان ویران کردند.
**سماقوڵی گرتلە:** گوندێك لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد [ف] روستایی در کردستان کە بعثیان ویران کردند.
**سماقە:** لەش ڕەقبوُن لە سەرماوە، ڕەوەنج، ڕەقیتە [ف] نوعی بیماری دام.
**سماقیـە:** گوندێکی کوردستـانە لەلای دیاربەکر [ف] از روستـاهای کردستان.
**سمان:** کونبون [ف] سوراخ شدن.
**سماندن:** کونکردن [ف] سوراخ کردن.
**سماو:** کونکراو [ف] سوراخ شده.
**سمایل:** سوکەڵەناوی ئیسماعیل [ف] مخفّف اسماعیل.
**سمـایلاوا:** گوندێکی کوردستانە بەعسی وێرانی کرد [ف] از روستاهای کردستان کە بعثیان ویران کردند.
**سمبڕ:** ئامرازی سمتاشین، سمارتە [ف] سمتراش.
**سمبل:** ئاوێ کە بەخێر دەدرێ [ف] آب خیراتی.
**سمبلاك:** زەردەماسی [ف] ماهی اوزونبرون.
**سمبـــلانـدن:** تازە سمێڵ بۆربـوُن، تازە خەتدان [ف] پا در سن بلوغ گذاشتن پسران.
**سمبۆرە:** سفۆر، سقۆر، سمورە [ف] سمور.
**سمبەری:** جۆرێ داری بێبەر [ف] درختی است بی‌ثمر.
**سمبێل:** ۱) موُی پشت لێوی پیاو، سمێڵ؛ ۲) گونـدێکی کوردستـانـە بەعسی وێرانی کرد [ف] ۱) سبیل؛ ۲) از روستاهای کردستان کە بعثیان ویران کردند.
**سمبێڵ:** سمبێل، سمێڵ [ف] سبیل.
**سمبێڵ بۆق:** سمێڵ قیت، برێتی لە مرۆی ئازاو لەخۆ بایی [ف] کنایە از شجاع و مغرور.
**سمبێڵ شۆڕ:** برێتی لە مرۆی بێ ئاکـارو بێ ویجـدان [ف] کنـایە از بی‌وجدان و تبهکار.
**سمبێلۆك:** گوڵێکی بۆنخۆشە [ف] گُلی است خوشبو.

**سمبێلەك:** زەردەماسی [ف] نوعی ماهی زردرنگ.

**سمپارە:** کاغەزی تەختەو ئاسن لوُس کردن، سماتە [ف] سنبادە.

**سمت:** ۱) کونی دەسکرد؛ ۲) ئەستورایی بەر کەمەر، لاقوُن: (گیر نەبو دەستم لەبەر لوُسی بە **سمتی** خڕیەوە) «شێخ رەزا» [ف] ۱) سوراخ مصنوعی؛ ۲) باسن.

**سمتاش:** سمبڕ [ف] سمتراش.

**سمتاندن:** کون کردن [ف] سوراخ کردن.

**سمتراش:** سمبڕ [ف] سمتراش.

**سمتن:** کون کردن [ف] سوراخ کردن.

**سمتوساتان:** دیمەنی سمتی ژنی جوان [ف] منظرهٔ باسن خوشگلان.

**سمتۆك:** کون کەر [ف] سوراخ کننده.

**سمتۆڵ:** سمت، لاقوُن، کەفەلی مروّ [ف] باسن.

**سمتە:** وردی زوّری پێکەوە نوساو، توّلا [ف] نگا: توّلا.

**سمتەراش:** سمبڕ [ف] سمتراش.

**سمتەگڵ:** گڵی پێکەوە چەسپاوی زەلام، سندە، کلوّ [ف] کلوخ.

**سمتین:** کون کردن، سمین [ف] سوراخ کردن.

**سمدار:** جانەوەری بەسم [ف] دارای سُم.

**سمدمد:** خەزایی، عایلەمەن [ف] سار ملخ خوار.

**سمڕ:** سڕمە [ف] جنجال.

**سمڕاخە:** چلکی گوێ [ف] چرك گوش.

**سمڕاو:** پیاوی پتەوی توندگوّشت [ف] قوی بنیهٔ بهم آمده، توپر.

**سمڕسمڕ:** هەراو دەمەقاڵە [ف] جنجال و نزاع.

**سمڕە:** پاشڵی دوُگی مەڕو بەران [ف] دنبالهٔ دُمبهٔ گوسفند.

**سم ڕەشی:** نەخوّشیەکی ئاژەڵە [ف] نوعی بیماری دام.

**سمسا:** گیایەکی بوّن خوّشە [ف] گیاهی خوشبو.

**سمسار:** دەلاّلی بازار [ف] سمسار.

**سمسارك:** مردارخوّرێکی سپی بوّرە، سیسارگ [ف] کرکس.

**سمسك:** نەفەس پیس، چاوپیس، شوُم [ف] نحس، شوم.

**سمسێر:** سمسار [ف] سمسار.

**سمسیرە:** تلفی ترێی گوشراو، تلتەهەنگوُر [ف] تفالهٔ انگور آبگیری شده.

**سمقە:** زەوی نەرم و راست کە بێ جوت لێ دان چەلتوُکی لێ دەچێنن [ف] زمین هموار نرم که بدون شخم شالی در آن می کارند.

**سمکاك:** بەری گیایەکە بوّ دەرمان دەشێ [ف] دانهٔ گیاهی دارویی.

**سمکوّ:** ۱) سوکەڵەناوی ئیسماعیل؛ ۲) دەست بەزەویدا کوتانی ئەسپ [ف] ۱) مخفّف اسماعیل؛ ۲) سم بر زمین کوبیدن اسب.

**سمکوت:** جێگەی بە سم کوتراو [ف] با سُم کوبیده شده، لگدکوب.

**سمکوّت:** کەفچی گەورەی دار [ف] قاشق بزرگ چوبین.

**سمکوّد:** سم گەورە، پەسنی ئەسپی رەسەنە [ف] از مشخصات اسب اصیل، پیل سم.

**سم کوّدك:** سم گەورە، پەسنی ئەسپی رەسەنە [ف] پیل سم.

**سم کوردك:** سمکوّد [ف] پیل سُم.

**سمکوّك:** گیایەکە بوّ دەرمان دەشێ [ف] گیاهی است طبّی.

**سمکوّڵ:** سم بەزەویدا کوتانی ئەسپ، سمکوّ [ف] سم بر زمین کوبیدن.

**سمکوّڵان:** سمکوّڵ [ف] نگا: سمکوّڵ.

**سمکولی:** نەخوّشی سمی ئاژەڵ [ف] بیماری سم حیوان.

**سمڵ:** ۱) گیایەکە بنێکی بوّن خوّشی هەیە، سوّتکە؛ ۲) گوڵێکی وەنەوشی بوّن خوّشە؛ ۳) گەردانەی مێخەك، مێخەکبەند [ف] ۱) مشك زمین؛ ۲) گیاه سنبل؛ ۳) گردنبند از میخك.

**سمنج:** ۱) رژد، رەزیل؛ ۲) سەرسەخت و نەگونجاو [ف] ۱) خسیس؛ ۲) ناباب و سرسخت.

**سموّ:** ۱) مەتکەو، ئامرازی شت کون کردن؛ ۲) سوکەڵەناوی ئیسماعیل [ف] ۱) متهٔ سوراخ کردن؛ ۲) مخفّف اسماعیل.

**سموچك:** قەڵشاوی ناو سم، نێوان سمی ئاژەڵی دوسم [ف] شکاف سم حیوان.

**سموّر:** سفوّر، سفوّرا [ف] سمور.

**سموّرتە:** ساموّرتە [ف] بند فتراك.

**سموّرچکە:** سموچك [ف] شکاف سم حیوان.

**سموّرە:** سفوّر، سفوّرا [ف] سمور.

**سموّقی:** ۱) بەرەنگی سماق؛ ۲) هوّزێکی کوردە [ف] ۱) بەرنگ سماق؛ ۲) عشیرەای است کرد.

**سموّلەك:** سموّرە [ف] سمور.

**سمە:** ۱) مەتکەو، ئامرازی کون کردن؛ ۲) سوکەڵەناوی ئیسماعیل [ف] ۱) متە؛ ۲) مخفّف اسماعیل.

**سمەخرتە:** ۱) جانەوەرێکی دەست و پا کورتە؛ ۲) برێتی لە باوەعەمرە [ف] ۱) حیوانی است دست و پا کوتاه؛ ۲) کنایە از کوتولە.

**سمەخوّرکە:** نەخوّشیەکی ماڵاتە [ف] نوعی بیماری دام.

**سمەر:** ساقەتە دەخڵی وردکراو، کا [ف] کاه.

**سمەری:** کای کوّن و ڕزیو [ف] کاه کهنه و پوسیده.

**سمەسا:** کونەدیواری بابوێر [ف] سوراخ بادکش در دیوار.

**سمەشلە:** نەخوّشی سمی ئاژەڵ، سمکولی [ف] بیماری سم حیوان.

**سمەشەلە:** سمەشلە [ف] نگا: سمەشلە.

**سمەك:** کونکەر، مەتکەو، سمە [ف] متّە.

**سمە کوتێ:** سمکوّڵ [ف] نگا: سمکوّڵ.

**سمەلوّچکە:** قیتکەی پشتی سمی ئاژەڵ [ف] زائدهٔ پشت سم چهارپایان.

**سمەلەك:** زەردەماسی [ف] ماهی اوزون برون.

**سمەوچ:** جوّرێ توّمی گەنم [ف] نوعی بذر گندم.

**سمەوەج:** جوّرێ گەنم [ف] نوعی گندم.

**سمیارك:** سمسارك [ف] کرکس.

**سمیت:** ۱) جوّرێ نانی بە ئاڵقەی رەق؛ ۲) چەمەنتوّ [ف] ۱) نوعی نان؛ ۲) سیمان.

**سمیتك:** ۱) چێشتی وردەساواری تراو، شلەبرُوش؛ ۲) بنەگیایەکە، گرالك [ف] ۱) آش بلغور آبکی؛ ۲) بوتەای صحرایی.

**سمێڕ:** پتەوی ئەندام [ف] محکم اندامی، توپری.

**سمێڕیان:** پتەو بوُنی ئەندام، تێك سمڕان [ف] محکم شدن اندام و بهم

آمدن، تو پر بودن.
**سمێڵ:** سمبێڵ ف سبیل.
**سمێڵ‌بابر:** ۱) سمێڵ زل؛ ۲) برێتی له خه‌ڵـك ترسێن و زۆردار ف ۱) سبیل کلفت؛ ۲) کنایه از بزن‌بهادر.
**سمێڵه:** جۆرێ ماسی ف نوعی ماهی.
**سمین:** کون کردن ف سوراخ کردن، سفتن.
**سمێنو:** ناوی گوندێکه له نێو مه‌نگوڕان ف نام دهی در منطقهٔ «منگوڕ».
**سن:** ۱) سمته‌گڵ، کلۆ، که‌سته‌ك؛ ۲) جانه‌وه‌رێکی چکۆڵه‌ی خڕی بۆره به‌لای گه‌نمه؛ ۳) داری دولك که پێستی سه‌گ و نچیری پێ باده‌ده‌ن؛ ۴) لۆتکه‌ی چیا ف ۱) کلوخ؛ ۲) سن، آفت گندم؛ ۳) چوب دوشاخه که پوست حیوان را بدان تاب دهند؛ ۴) قلهٔ کوه.
**سنارچه:** گونـدێکی کوردستانه به‌عسی وێرانی کرد ف از روستاهای کردستان که بعثیان ویران کردند.
**سنان:** ۱) نه‌خۆشیه‌کی یه‌کسم کوژه؛ ۲) جوێنێکه ف ۱) نوعی بیماری کشندهٔ ستور؛ ۲) دشنامی است.
**سنامه‌کی:** گیایه‌که بۆره‌وان بوونی زگ باشه ف گیاهی است مسهل.
**سنبل:** گوڵێکه گه‌ڵاگوڵی وردی شینه ف سنبل.
**سنپنگ:** گیایه‌کی بۆن خۆشه ده‌گه‌ڵ ژاژی و په‌نیری ده‌که‌ن ف گیاهی خوشبو که با شیراز و پنیر آمیزند.
**سنت:** یێن ده‌فـه، شتێکـه هه‌نـگ *دیواری خه‌ڵیفی پێ سواغ ده‌دا* ف ماده‌ای که زنبور بر کندو مالد.
**سنتر:** زاروی بێ‌دای و بابی ئاواره ف یتیم بی‌سر پرست و آواره.
**سنـج:** ۱) دارسنجـو؛ ۲) زه‌نگـوڵه‌ی زل؛ ۳) ژاڵه، لوڕك ف ۱) درخت سنجد؛ ۲) زنگولهٔ بزرگ؛ ۳) خر زهره.
**سنجاخ:** ده‌رزیله‌ی زه‌نبه‌ر که له پێسیر یان له پرچ ده‌درێ ف زیوری است.
**سنجاغ:** ۱) سنجاخ؛ ۲) ناوی گوندێکه ف ۱) نگا: سنجاخ؛ ۲) نام دهی است.
**سنجاف:** په‌راوێزی جلك، که‌ناره ف سجاف.
**سنجاق:** سنجاخ ف نگا: سنجاخ.
**سنجر:** بڵێسه به‌رزبونه‌وه‌ی ئاگر ف شعلهٔ بلند آتش.
**سنجران:** بڵێسه‌داربونی ئاگر ف شعله‌ور شدن آتش.
**سنجـرانـدن:** وه‌بڵێسـه خستن، داخستنی ته‌نـدوور، ته‌ندوور نێڵدان ف افروختن تنور.
**سنجرین:** سنجران ف نگا: سنجران.
**سنجك:** ده‌فری گڵین بۆ بن بێشکه‌ی منال ف ظرف گلین زیر گهوارهٔ بچه.
**سنجو:** سرینچك ف سنجد.
**سنجوق:** ۱) رۆخڵه‌ی ئه‌ستوور؛ ۲) باسوخ ف ۱) رودهٔ کلفت؛ ۲) باسلق.
**سنجۆق:** دارده‌ستی سه‌ردادراو که منال له کایه‌دا ده‌یچه‌قێنن ف چوبی که کودکان در بازی بر زمین می‌کوبند.
**سنجۆقێن:** کایه‌ی سنجۆق ف بازی «سنجوق».

**سنجه‌ق:** ۱) سنجاخ؛ ۲) ناوچه، مه‌ڵبه‌ندێکی پچوك ف ۱) نگا: سنجاخ؛ ۲) بخش، ناحیه.
**سنجه‌ی:** ۱) سنجو؛ ۲) عه‌نناب، به‌رێکه له سنجو ده‌کا ف ۱) سنجد؛ ۲) عنّاب.
**سنجی:** ۱) سنجه‌ی؛ ۲) به‌ری دارێکه تامی ترشه ف ۱) نگا: سنجه‌ی؛ ۲) ثمر درختی است ترش‌مزه.
**سنجێری:** جۆرێ ترێ که بۆ دۆشاو په‌سنده ف نوعی انگور.
**سندان:** ۱) سنان؛ ۲) ده‌زگای شت له سه‌رکوتانی پینه‌چی و ئاسنگه‌ر؛ ۳) ته‌رزه‌جـوێنێکـه وه‌ك قوزه‌ڵقـورت ف ۱) نگـا: سنـان؛ ۲) سنـدان پینه‌دوزان و آهنگران؛ ۳) دشنامی است بجای کوفت و زهرمار.
**سنداناوی:** نه‌خۆش به ده‌ردی سندان ف بیمار «سنان».
**سندانك:** بستوگه، کوپه‌ڵه، کوپه‌ی چکۆڵه ف بستو، خم کوچك.
**سنـداوا:** گونـدێکی کوردستـانه به‌عسی وێرانی کرد ف از روستاهای کردستان که بعثیان ویران کردند.
**سندروێك:** دار به‌ستی مردوگوازتنه‌وه، تابوت ف تابوت.
**سندریك:** تابوت، سندروێك ف تابوت.
**سندك:** سمیتك ف آش بلغور آبکی.
**سندم:** پێوه‌ندی ئاسن ف شکال، پای‌بند آهنی.
**سنـدوری:** گوندێکی کوردستانه به‌عسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان به‌دست بعثیان.
**سندوس:** ناوچه‌یه‌که له کوردستان ف منطقه‌ای در کردستان.
**سندوق:** ۱) جانتای دارینی زل بۆ که‌ل و په‌لی ناو ماڵ؛ ۲) به‌لاگه‌ردان: (سنـدوقی سه‌ری کوره‌کـه‌ت، به سندوقی سه‌رت بم)؛ ۳) قه‌وان، گرامه‌فۆن ف ۱) صندوق؛ ۲) بلاگردان؛ ۳) گرام، گرامافون.
**سنـدول:** ده‌فـری له دار یان له به‌رد بۆ چه‌ڵتوك و ساوارکوتان ف ظرف چوبی یا سنگی برای شالی و گندم‌کوبی.
**سندولان:** ناوی گوندێکی شێخه‌دێیه ف نام دهی است.
**سنده:** سمته، تولا ف نگا: تولا.
**سنده‌گل:** سمته‌گڵ ف کلوخ.
**سندی:** هۆزێکی کورده له‌لای زاخۆ ف عشیرتی است کُردزبان.
**سندیان:** سندانی پینه‌چی و ئاسنگه‌ر ف سندان.
**سنسل:** مۆغه‌ره‌ی پشت ف ستون فقرات.
**سنعات:** پیشه ف صنعت.
**سنعات‌کار:** پیشه‌ساز ف صنعتگر.
**سنف:** هاوپیشه ف صنف، همکار.
**سنك:** ساجوڕ، ساژور ف ساجور.
**سنکۆلك:** قولێنگ، قولنگه ف کُلنگ.
**سنگ:** ۱) له زگ به‌ره‌ژوور تا پێسیر؛ ۲) بزماری ئه‌ستور له دار یان ئاسن؛ ۳) نه‌خـۆشی کرم له زگدا؛ ۴) ده‌رزی زه‌لامی جه‌واڵ دروون ف ۱) سینه؛ ۲) میخ کلفت؛ ۳) بیماری کرم در شکم؛ ۴) جوالدوز.
**سنگان:** ۱) نه‌خۆشی سنان؛ ۲) جۆرێ نه‌خۆشی که له سه‌رماوه تووشی مرو ده‌بێ؛ ۳) به‌لایه‌که تووشی بێستان دێ ف ۱) نگا: سنان؛ ۲) نوعی

بیماری از سرما؛ ۳) یکی از آفات پالیز.

**سنگاناوی:** میوەی بێستانی سنگان لێدراو ف میوهٔ پالیز «سنگان»زده.

**سنگان لێدراو:** سنگاناوی ف نگا: سنگاناوی.

**سنگ داقوتان:** گوڵمیخی زل لە زەوی کوتان ف میخ کلفت بر زمین کوبیدن.

**سنـگ داکـوتان:** ۱) سنگ داقوتان؛ ۲) برێتی لە نەروێشتنی میوانی خوێنتاڵ: (**سنگی داکوتاوه** هەر ناروا) ف ۱) میخ کلفت کوبیدن؛ ۲) کنایه از نرفتن مهمان مزاحم.

**سنگ‌دان:** زگ‌دانی دیوار ف برآمدگی دیوار.

**سنگ دانەپێش:** خۆنواندن، خۆ تێ هەڵقوتاندن ف خودنمایی کردن.

**سنگ دانەپێشەوه:** سنگ دانەپێش ف خودنمایی کردن.

**سنگ‌زەرده:** مەلێکی پچوکی سنگ زەرده ف پرنده‌ای کوچك سینه‌زرد.

**سنگ قوتان:** بە لەپی دەست لەسنگدان ف سینه‌زنی.

**سنگك:** زیرك، زیپکه ف جوش پوست.

**سنـگ کوتـان:** ۱) بزمـاری زل داکوتان؛ ۲) سنگ قوتان: (دایکی دز جاریٚ سنـگ‌دەخـوا جاریٚ **سنـگ‌دەکـوتی**) ف ۱) میخ درشت کوبیدن؛ ۲) سینه‌زنی.

**سنگ لێ کوتان:** برێتی لە توٚك لێ کردن ف کنایه از دعای شر برای کسی کردن.

**سنگه:** دەرپەڕیو لە شتێك ف برآمدگی از چیزی.

**سنگەباز:** بازدان بە هەنگاوی بەرز ف دویدن با پرش، جهش.

**سنگەبەر:** سنگ لێ داکوتراو ف میخکوب شده.

**سنگەبێ:** چەق، نەبزو ف ثابت، غیرمتحرّك.

**سنگەچەڵەمه:** دەفەی سنگ، پانایی سینه ف پهنای سینه.

**سنگەسنگ:** ۱) سرمەسرم، هەراو چەقه؛ ۲) خاوەخاو ف ۱) جنجال و هیاهو؛ ۲) اهمال و سستی در کار.

**سنگەسنگه:** خاوەخاو ف اهمال در کار.

**سنگـــەك:** عازەوی، زیپکـەی روخسـاری تازەلاوان ف عَرَبی، نوعی جوش صورت.

**سنگەوباز:** سنگەباز ف نگا: سنگەباز.

**سنگەوبازد:** سنگەباز ف نگا: سنگەباز.

**سنـگ هەڵکێش:** برێتی لە کەسێ خوٚی نیشان دەداو تاریفی خوٚی دەکا ف کنایه از خودنما و لاف‌زن.

**سنگ هەڵکێشان:** خوٚشاندان‌و تاریفی خوٚ کردن ف خودنمایی و لاف‌زنی.

**سنله:** سلەگوٚ، تەپەگوٚ ف تکه مدفوع، سنده.

**سننان:** سندان ف نگا: سندان.

**سنوٚ:** ۱) دەردی روٚخڵەکوٚره؛ ۲) باڵغ بوٚنی سەگ کە پاش ساڵەوەختێکه: (**سنوٚی هاتوٚتەوه**) ف ۱) بیماری آپاندیسیت؛ ۲) بلوغ سگ.

**سنوٚبەر:** دارێکه، سنەوبەر ف درخت صنوبر.

**سنوٚته:** ۱) زوٚڵ، بیژو، حەرامزاده؛ ۲) چەورەو بێکاره ف ۱) حرامزاده؛ ۲) اوباش.

**سنوٚر:** حدود، کەوشەن، خەتی نێوان دو مڵك ف مرز.

**سنوٚر پەڕاندن:** برێتی لە کاری نائاسایی کردن ف کنایه از کردار غیرعادی.

**سنوٚرته:** سنوٚته ف نگا: سنوٚته.

**سنوٚرچه:** لکی تازە لە دار دەرچوٚگ ف جوانهٔ تازه.

**سنوٚردار:** کەوشەن دیاری کراو ف محدود.

**سنوٚردانان:** کەوشەن دیاری کردن ف تحدید، تعیین حدود.

**سنوق:** سندوٚق ف نگا: سندوق.

**سنـه:** ۱) سنـده، توٚڵا، سمته؛ ۲) سڵی، رەوەکی؛ ۳) شارێکی گەورە لە کوردستان ف ۱) نگا: توٚڵا؛ ۲) رَم؛ ۳) شهری بزرگ در کردستان، سنندج.

**سنەوبەر:** دارێکی گەڵا دەرزیە بەرێکی لە بیچمی دڵی مروٚ دەگرێ ف صنوبر.

**سنەی:** جوٚرێ ترێ کە زوٚ پێ دەگا ف نوعی انگور زودرس.

**سنێ:** دارێکە لە لامل‌و کە لەکەی ئاژەڵی دە بەستن تا دەمی نەگاتە برینی خوٚی ف چوبی که بر گردن و کفـل حیوان می‌بندند تا زخم خود را ناسور نکند.

**سنیاگ:** ۱) کڕاو، کڕدراو؛ ۲) ئەستێندراو ف ۱) خریده؛ ۲) گرفته شده.

**سنێتر:** سنت ف نگا: سنت.

**سنێر:** ریخ، شیاکه، گوٚگا، سەرین ف سرگین.

**سنێرگه:** جێگەی رژاندنی شیاکەو پەین، سەرەنوێلك، گوٚفك ف شوله، شلته، سرگین‌گاه.

**سنێژه:** ئامرازێکی دەزگای جوٚلایی ف از ابزار بافندگی.

**سوٚ:** ۱) کونـی دەرزی؛ ۲) گومـــان‌و دودڵی؛ ۳) ئێش‌و ژان؛ ۴) سارێژ: (بـرینم هاتـوٚتەوە سوٚ)؛ ۵) گیایەکە دەگەڵ پەنیر دەکرێ؛ ۶) بەهره، کەڵـك: (کاردەگەڵ توٚ بێ سوٚیه)؛ ۷) دەردە باریکه، دیق؛ ۸) دوکەڵی پەڕوٚی سوتاو؛ ۹) سبەی؛ ۱۰) کەبەك، درشتەی ئارد کە لە سەر هێڵەگ دەمێنێ؛ ۱۱) کزێژی سەر؛ ۱۲) پرزەی گوڵـەگەنم‌و جوٚ، داسـولکه؛ ۱۳) نوٚر، روٚنـاکی؛ ۱۴) کەنـارەی ئاسمـان: (ئاسوٚ) ف ۱) سوراخ سوزن؛ ۲) گمــان؛ ۳) درد والم؛ ۴) التیام؛ ۵) گیاهی است با پنیر آمیزند؛ ۶) بهره، فائده؛ ۷) بیماری سل؛ ۸) دود پنبهٔ سوخته؛ ۹) فردا؛ ۱۰) نخالـه؛ ۱۱) سبوسـهٔ سر، شوره؛ ۱۲) اخگـل، داسه؛ ۱۳) روشنایی؛ ۱۴) کنارهٔ آسمان، افق.

**سوٚ:** ۱) ئێرەیی؛ ۲) تاســـه؛ ۳) فایده، قازانـج؛ ۴) بەزەیی؛ ۵) گلەیی، گازن؛ ۶) خێزانی ماڵ؛ ۷) کونی قوٚن؛ ۸) روٚژی دوایی، سبـەی؛ ۹) بەیانی زوٚ، بەرەبـەیان؛ ۱۰) داخ‌و حەسـرەت؛ ۱۱) پشتێر: (گاوسوٚ)؛ ۱۲) تێژ کردن وە هەسان؛ ۱۳) خەم؛ ۱۴) کول: (دەمەسوٚ بوٚگه)؛ ۱۵) بە شوشتن چڵك نەچوٚن: (کراسەکەت چڵکە سوٚ بوه)؛ ۱۶) قازانجی پارەی قەرز ف ۱) رشك، حسد؛ ۲) اشتیاق؛ ۳) سود؛ ۴) ترحّم؛ ۵) گله؛ ۶) افراد خانواده، عائله؛ ۷) سوراخ مقعد؛ ۸) فردا؛ ۹) بامداد؛ ۱۰) حسرت و اندوه؛ ۱۱) طویله؛ ۱۲) تیز کردن؛ ۱۳) غم؛ ۱۴) کُند، مقابل تیز؛ ۱۵) چرك مرده شدن؛ ۱۶) ربا.

**سوا:** سبەی، ڕۆژی کەدادێ ف فردا.
**سواب:** پاداشی چاکە لە خوداوە: (خوا سوابت بنوسێ) ف ثواب.
**سواپ:** ساپ ف شن صاف و نازك.
**سواخ:** حەڕی پیامالین ف گل‌اندود.
**سواخدان:** حەڕی مالین بە دیوارو خانـوُدا، قوڕسـاوین بە دیوارا ف گل‌اندود کردن.
**سواخ کێشان:** سواخ دان ف گل‌اندود کردن.
**سوار:** ١) بەرانبەری پیادە، کەسێ کە بەسەر بارەبەر یا هەرشتێکی ترەوە سەفەر دەکا؛ ٢) زاڵ، باوخۆش؛ ٣) بڵندتر، بەرزتر؛ ۴) مناڵێ کە قاچی لەپێش سەریدا دێتـە دنیاوە ف ١) سوار؛ ٢) چیره؛ ٣) بلنـدتـر؛ ۴) نوزادی کە پایش قبل از سر آید.
**سواربـوُن:** ١) خۆهـاویشتنە سەر پشتی حەیوان یان هەرچی؛ ٢) بڵند بەرانبەر بە نزم ف ١) سوار شدن؛ ٢) بلندتر واقع شدن.
**سوارچاك:** کەسێ لە ئەسپ سواریدا زۆر کارامەیە ف سوارکار ماهر.
**سوارخاس:** سوارچاك ف سوارکار ماهر.
**سوارخە:** چیلکە ف شاخه کوتاه و باریك درخت.
**سواركردن:** بەسەریەکدا بەستن ف مونتاژ کردن.
**سوارە:** ١) سواری ئەسپ؛ ٢) دەستەی سواران؛ ٣) ناوی پیاوانە ف ١) سوار؛ ٢) تیپ سواره؛ ٣) نام مردانه.
**سوارەی شەترنج:** شەش جۆرەداشی شەترنج. «شا، وەزیر، ڕوخ، فیل، ئەسپ، پیادە» ف مهرهٔ شطرنج.
**سواری:** ١) کاری سواری؛ ٢) بارەبەرێ کە بۆ سواری دەست ئەدا؛ ٣) ناوی گوندێکە ف ١) سواری؛ ٢) ویژهٔ سواری؛ ٣) نام دهی.
**سواژ:** جەنگ، شەڕو هەرا ف جنگ و ستیز.
**سواش:** سواژ ف جنگ و ستیز.
**سواغ:** سواخ ف نگا: سواخ.
**سواڤ:** ١) بەربەرۆچك، بەرۆژ؛ ٢) ئاوهەڵدێر ف ١) آفتابگیر؛ ٢) آبشار.
**سواڵ:** پارسە، دەرۆزە ف گدایی.
**سوالـك:** ١) پارچەی شکاوی دەفری گڵینی سورەوەکراو؛ ٢) دەفری خواردن تێ کردن بۆ بەشدار ف ١) سفال شکسته؛ ٢) ظرف خوراك سگ.
**سواڵکردن:** پارسەکردن، دەرۆزە کردن ف گدایی کردن.
**سواڵکەر:** دەرۆزەکەر ف گدا.
**سواڵە:** پڕی دەست لە دروێنە ف پردست از درویده.
**سواڵەت:** پارچە دیزەو گۆزە، سواڵك ف شکستهٔ سفالین.
**سوان:** ١) لە ڕێك خستن ڕێكو لوس بوُن، ساوان؛ ٢) بڕ بـەنـد ف ١) ساییده شدن؛ ٢) سوهان.
**سواندن:** ساوین ف نگا: ساوین.
**سواندنەوە:** زۆر ساوینەوە ف سودن زیاد.
**سواندۆکە:** پاساری ف گنجشك.
**سواندوُکە:** سواندۆکە ف گنجشك.
**سواندولکە:** پاساری ف گنجشك.
**سواندە:** پاسارە ف لب بام.
**سواندیلکە:** پاساری ف گنجشك.
**سوانن:** سواندن، ساوین ف نگا: ساوین.
**سوانە:** سواندە، پاسارە ف لب بام.
**سوانەوە:** سواندن، ساوین ف ساییدن.
**سواو:** ١) ساویاگ؛ ٢) سواب ف ١) ساییده؛ ٢) ثواب.
**سوب:** ١) بەرەبەیان؛ ٢) سبەی ف ١) بامداد؛ ٢) فردا.
**سوبا:** ڕۆژی دادێ ف فردا.
**سۆبا:** ١) زۆپا، کوُرەی ئاگر لە کانزا؛ ٢) مەلەوان؛ ٣) ڕەبەن، بێ‌ژن ف ١) بخاری؛ ٢) شناگر؛ ٣) مجرّد.
**سوبات:** ١) خۆڕاگرتن لە تەنگانەدا؛ ٢) پشوُ لەسەر خۆیی؛ ٣) بێ‌ژن‌و ماڵ: (سـەڵت‌و سوبـات) ف ١) مقـاومت در مقـابل مشکلات؛ ٢) بردباری؛ ٣) مجرد.
**سۆباهی:** مەلەوانی، مەلە ف شنا.
**سۆبایی:** سۆباهی ف شنا.
**سوب سەحەر:** بەیانی زو ف بامدادان.
**سوبە:** ڕۆژی دادێ ف فردا.
**سۆبە:** زۆپا، سۆبا ف بخاری.
**سۆبەت:** عەجایب، سەیر، سەمەرە ف شگفت.
**سوبەزوُ:** دەست پێ کردنی ڕۆژی دادێ ف فردا پگاه.
**سوبێ:** سوبە ف فردا.
**سوبیانێ:** سوبە ف فردا.
**سوپ:** ڕیزەبەردێ کە داری دەخەنە سەر بۆ ڕاوەماسی ف سنگهای ردیف در مسیر رودخانه که چوب بر آنها گذارند برای صید ماهی.
**سۆپ:** ١) جوتەگای دابەستراو؛ ٢) سوپ ف ١) جفت آمادهٔ شخم؛ ٢) نگا: سوپ.
**سوپا:** لەشکر، سپا ف سپاه.
**سۆپا:** زۆپا، سۆبا ف بخاری.
**سوپاخانە:** سپاگە ف پادگان.
**سۆپار:** جۆرێ گاسن ف نوعی گاوآهن.
**سوپاڕان:** سەرکردەی سپاە ف فرماندهٔ سپاه.
**سۆپاژۆ:** جوتکار، کەسێ کە بە گاجوت زەوی دەکێڵێ ف شخم‌زن با گاو.
**سوپاس:** سپاس ف سپاس.
**سوپاسالار:** سەرکردەی هەمو لەشکر ف سپهسالار.
**سۆپە:** زۆپا، سۆبە ف بخاری.
**سوپەر:** سپێر ف سپر.
**سوپێر:** سپێر ف سپر.
**سوپێل:** تاڤگە ف آبشار.
**سوُت:** ١) قوڵکـەی داو تێدانانەوە؛ ٢) قازانجی پارەی قەرز؛ ٢) خۆڵی کاغەزی سوتاو؛ ۴) بنەمای وشەی سوتان؛ ۵) شیر ف ١) چالهٔ دام؛ ٢) ربا؛ ٣) خاکستر کاغذ؛ ۴) ریشهٔ کلمهٔ «سوتان» بەمعنی سوختن؛

۵) شیر خوراکی.
**سوُتار:** ۱) قولّکەی داونانەوە، سوُت؛ ۲) سنوّتە؛ ۳)تەڵە، داو، تەپکە ف ۱) چالە دام؛ ۲) شارلاتان، حرامزادە؛ ۳) دام.
**سوُتال:** سوُتار ف نگا: سوُتار.
**سوُتـان:** ۱) ئاگرتێ بەربـوُن؛ ۲) برێتی لە فەوتـانی قەرز؛ ۳) برێتی لە نابوُت بوُن؛ ۴) برێتی لە تێپەڕبوُن لە رادەی دیاری کراو دە کایەدا ف ۱) سوختن؛ ۲) کنایە از فوت وام؛ ۳) کنایە از ورشکست شدن؛ ۴) کنایە از تجاوز از حدّ معین در بازی، سوختن در بازی.
**سوُتاندن:** ئاگرتێ بەردان ف سوزاندن.
**سوُتانن:** سوتاندن ف سوزاندن.
**سوُتانەوە:** برژانەوەی پێست یان برین ف سوزش پوست یا زخم.
**سوُتـــاو:** ۱) ئاگرتێ بەردراوی لەبـەین چوُگ؛ ۲) قەرزی فەوتـاو؛ ۳) دەسمـایە لە دەس چوُگ: ۴) تێ پەڕبـوُگ لە رادەی دیاری کراو دە کایەدا ف ۱) سوختـە؛ ۲) وام از بین رفتـە؛ ۳) ورشکست شدە؛ ۴) سوختە در بازی.
**سوُتاوە:** پێست کە توُشی سوُتانەوە بوە ف پوست کە سوزش دارد.
**سوُتخوّر:** کەسێ کە قازانجی پارەی قەرز دەستێنێ ف رباخوار.
**سوّتك:** بزوُت، سەرەبزوت ف نیمسوز.
**سوُتك:** خوّڵەمێشی نانو لوّکەو کاغەز ف خاکستر نان و پنبە و کاغذ سوختە.
**سوّتکە:** ۱) سمل، گیایەکە بوّ دەرمان دەشێ؛ ۲) ناوی گوندێکە ف ۱) گیاە سعد، مشك زمین؛ ۲) نام دهی.
**سوُتلی:** ژنی بێمارەییو بەکرێ گیراو بوّ ماوەیەك، قەپـاتمە ف همسر موقّتی بدون نکاح.
**سوُتمان:** ئاگر بەربوُنەوە ف آتشسوزی.
**سوّتن:** سوُتان ف سوختن.
**سوُتن:** سوُتان ف سوختن.
**سوُتو:** سوُتك ف نگا: سوُتك.
سوّتە: بێدین، گوناحبار ف فاسق، کمباور بە دین.
**سوُتــە:** ۱) سوُتـاو: (بـورەن **سوُتـەدڵا**ن گەردین هەمـایوّم / کە دەردی **سوُتەدڵ دڵسوُتە** زوّنوّ) «بابەتایەر»؛ ۲) ناوی گوندێکە ف ۱) سوختە؛ ۲) نام روستایی است.
**سوّتـــەك:** ۱) سوُتـك؛ ۲) بزوُت؛ ۳) زەوی ئاگرتێبەردراو ف ۱) نگـا: سوُتك؛ ۲) نیمسوز؛ ۳) زمین سوختە.
**سوُتە کە:** گیایەکە دەناو ژاژی دەکرێ ف گیاهی است با شیراز آمیزند.
**سوُتەڵ:** بزوُت ف نیمسوز.
**سوُتەمەرو:** داری تێکوڵ بەئاگر هەڵپڕوزاو ف چوب پوست نیمسوختە.
**سوُتەمەنی:** شتانێ کە بوّ ئاگر بەکار دێن ف سوختنی.
**سوُتەنی:** سوُتەمەنی ف سوختنی.
**سوّتەی:** سوُتاو ف سوختە.
**سوّتی:** سوُتاو ف سوختە.
**سوُتیان:** ۱) سوُتان؛ ۲) مەمكبەند ف ۱) سوختن؛ ۲) پستانبند.
**سوُتیانەوە:** سوُتانەوە ف نگا: سوُتانەوە.
**سوُتێن:** هەچی شت دەسوُتێنێ ئاگر یان ئاگرتێ بەردەر ف سوزانندە، سوزان.
**سوُتێنەر:** سوُتێن ف سوزانندە، سوزان.
**سوججە:** سجە، رەنگی سوُر بوّ مار ف نگا: سجە.
**سوُجگەر:** جەرگو دڵ بوّ برژاندنو لێنان ف دل و قلوە و جگر.
**سوجە:** سجە، سوججە ف نگا: سجە.
**سوُجەرگ:** سوجگەر ف جگر و دل و قلوە.
**سوُچ:** ۱) تاوان، هەڵـە، گونـاح، خەتـا؛ ۲) قوژبن، گوّشە؛ ۳) بنەمای وشەی سوُچان واتا: ئاگرتێ بەربوُن ف ۱) گناە؛ ۲) گوشە؛ ۳) ریشۀ کلمۀ «سوُچان» بەمعنی سوختن.
**سوّچا:** سوُتا ف سوخت.
**سوُچا:** سوُتا، ئاگری تێ بەربو ف سوخت، ماضی سوختن.
**سوُچان:** سوُتان ف سوختن.
**سوُچبار:** خەتاکار، تاوانبار، گوناحبار ف گناهکار.
**سوُچدار:** ۱) سوُچبار؛ ۲) بەگوّشە، قولینچكدار ف ۱) گناهکار؛ ۲) گوشەدار.
**سوُچنای:** سوُتان ف سوختن.
**سوُچەر:** سوُچەڕ ف تشی.
**سوُچەڕ:** سیخوڕ، جانەوەرێکە لە جسنی ژوُژكو لەو گەورەتر ف تشی.
**سوُچیا:** سوُتا ف سوخت.
**سوّچیای:** سوُتان ف سوختن.
**سوّچێو:** سکڵدانی کانزا، مقەڵی، مەنقەڵی، مەنگەڵ ف منقل آتش، مجمر.
**سوّح:** ۱) روّژێ دادێ؛ ۲) بەرەبەیان ف ۱) فردا؛ ۲) بامداد.
**سوّحا:** سوّح ف نگا: سوّح.
**سوُخ:** خوُس، خوێز، ئاڵشت، زوقم ف پژ، سرماریزە.
**سوخار:** جوّخین، جێخەرمان ف جای خرمن.
**سوُخار:** سوُخ ف پژ، سرماریزە.
**سوخاڵ:** رەژو، رەژی، زوخاڵ، خەڵوّز ف زغال.
**سوخاڵدان:** رەژیدان ف اشبو، زغالدان.
**سوخت:** ۱) سوُتـەمـەنی؛ ۲) دەستەنگ، ژار، بەلەنگاز ف ۱) سوخت، سوختنی؛ ۲) بینوا.
**سوّخت:** سوُتەمەنی ف سوختنی، سوخت.
**سوختکردن:** روُت کردن، ماڵ لێ ساندن ف لخت کردن از دارایی.
**سوختــە:** ۱) دەرس خوێنی سەرەتایی، تازە فەقێ؛ ۲) کرێژی سوُتاوی تریاك کە دوبارە دەیکێشن ف ۱) طلبۀ دورۀ مقدماتی؛ ۲) سوختۀ تریاك.
**سوخـرە:** ۱) بە رەنگی خوێن، سوُر، سوّر؛ ۲) بێگـار ف ۱) سرخ؛ ۲) سخرە، بیگاری.
**سوّخرە:** بێگار ف بیگاری، سخرە.
**سوخمە:** ۱) زوخمە؛ ۲) دارێ کە وەبەر داری ترێی دەدەن ف ۱) یلك؛ ۲)

چوبی که تاك بر آن گذارند.

**سۆخۆر:** سۆتخۆر ف رباخوار.

**سۆخی:** ناکام ف نتیجه.

**سۆخین:** لەناکاما ف در نتیجه.

**سۆد:** ۱) قازانجی قەرز، سۆت؛ ۲) قازانجی سەودا ف ۱) ربا؛ ۲) بهره، سود معامله.

**سۆدخۆر:** سۆتخۆر ف رباخوار.

**سۆددار:** بەقازانج، بەهرەدەر ف مفید.

**سۆدره:** شەڕهەڵایسێن، مایەفیتنە ف فتنه‌انگیز.

**سور:** سروە، شنەبا، شیبا، بای هێدیو فێنك ف نسیم.

**سۆر:** ۱) به رەنگی خوێن؛ ۲) پڕخوێ؛ ۳) ئاشکرا، دیار؛ ۴) پێ چەقێن، پێ داگر؛ ۵) رەپو راست گوتن؛ ۶) بەزمو نان بەخشین: (خەتەنە سۆران، سۆرانەی خەرمان)؛ ۷) دیواری دەوری باغ؛ ۸) کۆی گەنم لە خەرمانەدا ف ۱) سرخ؛ ۲) شور، نمکین؛ ۳) آشکارا؛ ۴) مصّر، پافشار؛ ۵) رك و صریح؛ ۶) مهمانی و سور؛ ۷) دیوار پیرامون باغ؛ ۸) توده گندم در خرمن.

**سوڕ:** ۱) دڵکێشی، ئاکاری دڵبەری؛ ۲) نهێنی، راز؛ ۳) ناراستی دەکایەدا؛ ۴) جێگەی سەربەرەژێری خلیسك ف ۱) دلکشی، جاذبیّت؛ ۲) راز؛ ۳) حیله در بازی؛ ۴) نشیب لیزگاه.

**سۆڕ:** خول، زڤرین ف چرخش.

**سۆراتی:** رەنگ سۆری ف سرخ رنگی.

**سوڕاحی:** دۆڵکە، تونگە ف تنگ، پارچ.

**سۆراخ:** ۱) به دوی شتی گومبودا گەڕان؛ ۲) هەست بە جێگەی گومبوگ کردن: (کەوتمە سۆراخی، سۆراخم کردوە لە کوێ یە) ف ۱) سراغ گرفتن؛ ۲) سراغ کردن.

**سۆراغ:** سۆراخ ف نگا: سۆراخ.

**سۆراڤ:** بەری دار عەنتابی سۆر ف ثمر عناب قرمز.

**سۆراڤك:** دەرمانێ سۆر بۆ خۆجوان کردن ف غازه، سرخاب.

**سوراڤی:** بەرەنگی عەنتاب ف سرخ عنابی.

**سۆران:** ۱) مەڵبەندێکی زۆر پان و بەرین لە کوردستان؛ ۲) پارچەیەك لە چوارپاژی خاوەن زاراوەی تایبەتی لە کورد ف ۱) منطقه‌ای وسیع در کردستان؛ ۲) یکی از چهار لهجهٔ اصلی زبان کردی.

**سۆران:** ۱) میوانداری به هۆی روداوی خۆش: (خەتەنە سۆران)؛ ۲) سۆرەکان، ئەوانی رەنگ سۆر ف ۱) سور و مهمانی به مناسبت رویداد شاد؛ ۲) سرخها.

**سۆڕان:** خول خواردن، زڤرین ف چرخش.

**سۆرانچك:** ستۆکڕك ف سرخنای، خرخره.

**سۆڕاندن:** چەرخاندن، زڤراندن، خول پێدان ف چرخاندن، گرداندن.

**سۆڕاندنەوە:** گەشت پێ کردن، گەڕاندن ف به گشت وادار کردن، گرداندن.

**سۆڕانن:** سۆڕاندن ف چرخاندن.

**سۆڕاننەوە:** سۆڕاندنەوە ف نگا: سۆڕاندنەوە.

**سۆرانە:** ۱) میوانداری بەهوی خەرمان هەڵگرتن؛ ۲) دیاری رەعیەت بۆ ئاغا بەهۆی ژنهێنانەوە؛ ۳) کیلەیەك لە هەر بنەتۆیەك لە خەرمان بۆ ئاغادێ ف ۱) جشن و سور خرمن برداری؛ ۲) هدیهٔ داماد رعیت برای ارباب؛ ۳) از هر نوع بذر پیمانه‌ای هدیه به ارباب.

**سۆڕانەوە:** ۱) خول خواردن؛ ۲) گەڕان بەولاولادا ف ۱) چرخیدن؛ ۲) گردش کردن.

**سۆرانی:** ۱) خەڵکی وڵاتی سۆران؛ ۲) زاراوەی خەڵکی سۆران؛ ۳) ئەنگوچکی درێژو فش؛ ۴) جۆرێ هەرمێ، هەرمێ لاسۆرە ف ۱) اهل منطقهٔ «سۆران»؛ ۲) لهجهٔ اهل «سۆران»؛ ۳) آستین بلند؛ ۴) نوعی گلابی.

**سۆراو:** ۱) سۆراڤك؛ ۲) جۆرێ ترێ سۆرە؛ ۳) گیایەکە بۆ دۆکلیو؛ ۴) سواو؛ ۵) خوێ واوك، ئاوی سوێر؛ ۶) گوڵی پۆپەکەڵەشێرە ف ۱) غازه، سرخاب؛ ۲) نوعی انگور قرمز؛ ۳) گیاهی است در دوغبا کنند؛ ۴) نگا: سواو؛ ۵) آب نمك؛ ۶) گل تاج خروس.

**سۆراوە:** ۱) سواو، ساویاگ؛ ۲) کون کراو ف ۱) ساییده؛ ۲) سنبیده، سفته.

**سۆرایەتی:** سۆراتی ف سرخی.

**سۆرایی:** سۆراتی ف سرخی.

**سورب:** مز، جۆرێ کانزای نەرمە ف سرب.

**سوربازەڵە:** گیایەکە لە گیا دوکلیوان ف گیاهی است.

**سورباش:** هەمەکارەی ئاغا لەدێدا ف مباشر ارباب.

**سۆرباو:** رەنگی ئامالْ سۆر ف مایل به سرخی.

**سۆربلەتی:** گوێژی سۆر، گێوژە سۆرە ف زالزالك قرمز.

**سۆربۆرە:** ئەسپی بۆر که خاڵەکانی سۆر بن ف اسب بور با خالهای قرمز.

**سۆربۆز:** ئەسپێ که خاڵەکانی سوری کاڵ بن ف اسب سفید خال قرمز.

**سۆربۆن:** ۱) رەنگی سۆر بەسەرداهاتن؛ ۲) چەقین و پێداگرتن لە سەر کارێ ف ۱) سرخ رنگ شدن؛ ۲) اصرار ورزیدن.

**سۆربۆنەوە:** ۱) رەنگ سۆربۆنی کانزا بە تینی ئاگر؛ ۲) لەبەر حەیاو شەرم سۆرهەڵگەڕان؛ ۳) لە ناو رۆنا چزان؛ ۴) رۆن بۆنەوەی مەبەست ف ۱) سرخ شدن فلز از حرارت؛ ۲) سرخ رنگ شدن از شرم؛ ۳) در روغن سرخ شدن؛ ۴) روشن شدن موضوع.

**سۆربۆوە:** ۱) سۆرکراو لە کۆرەدا؛ ۲) چزاو لە رۆندا ف ۱) سرخ شده در کوره؛ ۲) سرخ شده در روغن.

**سۆربەسۆر:** بەئاشکراو رەپو راست ف به صراحت و رك.

**سۆربەش:** گوندێکە لە کوردستان لەلای هەولێر بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**سۆر بەشی خدری پاشا:** گوندێکە لە کوردستان لەلای هەولێر بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**سۆربەڵەك:** سۆر بەخاڵی سپیەوە ف قرمز با خالهای سفید.

**سۆرپاز:** ۱) سیرە کێویلە؛ ۲) گیایەکە دەئاش دەکرێ ف ۱) سیر کوهی؛ ۲) گیاهی است آشی.

**سوُرپڕنۆڵ:** دەموچاو سوُری ناحەز ف آدم سرخ رنگ بدقیافه.

**سوُرپەری:** دڵکێش و دڵرفێن و جوان وەك فریشتە ف زیباروی دلرُبا.

**سوُرپەری:** جوانی کوڵمەسوُر ف زیباروی گونەقرمز.

**سوُرپیاز:** ژەنگەسوُرە، زەنگەسوُرە ف زنبور درشت سرخ.

**سوُرچك:** سوُرانچك ف سرخنای، خرخره.

**سوُرچی:** ناوی هۆزێکو مەڵبەندێکە لە کوردستان ف نام عشیرتی و منطقه‌ای در کردستان.

**سورخ:** مەرەکەفی سوُر، رەنگی سوُر بۆ نوُسین ف جوهر قرمز برای نوشتن.

**سورخکاری:** رەنگاندن بە سورخ ف نقّاشی با جوهر قرمز.

**سوُڕخواردن:** خولدان، گەڕیان ف چرخش، گردیدن.

**سوُرخوُل:** مرۆی موزەردی ناحەز ف آدم مو زرد بدقیافه.

**سوُرخون:** ئەسپی سوُری ئاچخ بە پەڵەی سپیەوە ف اسب سرخ روشن با لکه‌های سفید.

**سوُرخـەزاڵ:** مرۆیان حەیوانی سوُری پڵپڵ ف آدم یا حیوان سرخ رنگ لکه‌لکه.

**سوُرداش:** ۱) کێویکە لە کوردستان؛ ۲) شارێك لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد ف ۱) کوهی در کردستان؛ ۲) شهری در کردستان که بعثیان ویران کردند.

**سوُرداگەڕان:** لەشەرمان سوُربوُن ف از شرم سرخ شدن.

**سوُرداگەڕیان:** سوُرداگەڕان ف از شرح سرخ شدن.

**سوُرداگیرسان:** سوُرداگەڕیان ف از شرم سرخ شدن.

**سوُڕدان:** ۱) خول‌خواردن؛ ۲) برێتی لە سەماورەقس؛ ۳) خول پێ‌دان؛ ۴) تۆڕدان، ئاویتـن ف ۱) چرخـیدن؛ ۲) کنـایه از رقص؛ ۳) چرخانیدن؛ ۴) پرت کردن.

**سوُرسات:** ئازوُقەی لەشکر کە لە رەعیەتانی دەستێنن ف سیورسات.

**سوُرسنەیی:** جۆرێ ترێ ف نوعی انگور.

**سوڕسوڕ:** ۱) سفرەبڕ، سیسرکە؛ ۲) مەشکە دڕە ف ۱) سوسك خانگی؛ ۲) جیرجیرك.

**سوڕسوُرك:** ستۆكڕك ف سرخنای، خرخره.

**سوڕسـوڕە:** ۱) مەشکـەدڕە؛ ۲) مەلێکی پچوکە؛ ۳) خول خولە ف ۱) جیرجیرك؛ ۲) پرنده‌ای کوچك؛ ۳) بادفر، فرفره.

**سوُرشامی:** جۆرێ ترێ ف نوعی انگور.

**سوُرفل:** سوُرخوُل ف مو زرد بدقواره.

**سوُرقـوُچ:** گوڵینگی بەران رازانـدنەوە کە لە سەرە کلکی سپی بڕاوی رەشەماڵ بۆی سوُر دەکرا ف نوعی منگولهٔ زینتی برای قوچ.

**سورك:** ۱) سوُرێژە؛ ۲) مۆریانە ف ۱) سرخك؛ ۲) موریانه.

**سوڕك:** ۱) ئاو هەڵدێر؛ ۲) جۆرێ زیپکەی سوُری وردە لە منداڵ دێت، سوُرێژە؛ ۳) هەرزن؛ ۴) گیایەکە ف ۱) آبشار؛ ۲) سرخك؛ ۳) ارزن؛ ۴) گیاهی است.

**سوڕك:** حەوزۆکەی تاك نەفەرە لە گەرماودا، جورنە ف حوضچهٔ یکنفری در گرمابه.

**سوُرکا:** هۆزێکی کوردە لە سوریە دەژی ف طایفه‌ای از کُردها در سوریه.

**سوُرکار:** ئاماڵ‌سوُر ف نگا: سوُرباو.

**سوُرکارە:** سوُرکار ف نگا: سوُرباو.

**سوُرکراوە:** ۱) لە کوُرەدا سوُربوُوە؛ ۲) لە رۆندا چزاو ف ۱) در کوره سرخ شده؛ ۲) در روغن سرخ شده.

**سوُرکراوەوە:** سوُرکراوە ف نگا: سوُرکراوه.

**سوُرکـردن:** ۱) بە رەنگی سوُر رەنگـانـدن؛ ۲) گەنم لە کا دەرخستن: (خەرمان **سوُرکردن**) ف ۱) سرخ رنگ کردن؛ ۲) گندم از کاه جدا کردن.

**سوُرکردنەوە:** ۱) لەرۆندا چزاندن؛ ۲) کانزا بە تینی ئاگر نەرم‌کردن؛ ۳) ئاشکـراکـردنی مەبـەست ف ۱) سرخ کردن در روغن؛ ۲) گداخته کردن فلز؛ ۳) آشکار کردن مطلب.

**سوُرکۆك:** رەنگ سوُری موُخورمایی ف سرخ‌فام موخرمایی.

**سوُرکوێت:** کوێتی رەنگ ئاچخ ف کُمیت روشن.

**سوُرکە:** ۱) سوُرك، سورێژە؛ ۲) سوُرك، هەرزن؛ ۳) چکۆڵەی سوُر؛ ۴) جۆرێ مێوژ، مێوژەسوُرکە ف ۱) سرخك؛ ۲) ارزن؛ ۳) آدم سرخ‌فام کوچك؛ ۴) نوعی کشمش.

**سوُرکەلە:** سوُرکەڵە ف سرخ کوچك.

**سوُرکەڵە:** رەنگ‌سوُری چکۆڵە ف سرخ کوچك.

**سوُرکەوگ:** سوُری ئاماڵ‌شین ف سرخ مایل به کبودی.

**سوُرکێ:** سوُرکە، سوُرێژە ف سرخك.

**سورگوڵ:** ۱) گوڵی گوڵاو؛ ۲) جۆرێ گەنم؛ ۳) برێتی لە ژنی زۆر جوان ف ۱) گل‌محمدی؛ ۲) نوعی گندم؛ ۳) کنایه از بسیار زیبا.

**سوُرگـوُڵ:** ۱) گوڵـە بـاغ؛ ۲) برێتی لە سەرپـەرستی ماڵ ف ۱) گل‌محمدی؛ ۲) کنایه از سرپرست خانواده.

**سوُرگوم:** ونداو بێ‌سەرو شوێن ف گمشدهٔ بی‌نشان و اثر.

**سورگی:** زمانەی گۆڵەی دەرگا ف زبانهٔ قفل چوبین در.

**سوُرلام:** دەموروسوُر، روخسار بەرەنگی سورکارە ف سرخ‌روی.

**سورم:** زەوی رۆتەن ف زمین بی‌گیاه لخت.

**سورمە:** ۱) تۆزی بڕەی زیو بەرەنگی رەشی ئاماڵ سوُر بۆ چاو یان موُ رەش‌کردن، کل؛ ۲) پەراوێزی بەزیو چندراوی عابا ف ۱) سرمه؛ ۲) حاشیهٔ سیم‌باف عبا.

**سورمـەدان:** ۱) تۆرەکەی چکۆڵەی جێگەی سورمە، کلتور؛ ۲) گۆی سەر خەنجەر ف ۱) سرمه‌دان؛ ۲) قبه بر دستهٔ خنجر.

**سورمەدو:** تۆرەکەی سورمە، سورمەدان، کلتور ف سرمه‌دان.

**سورمەرێژ:** پەراوێزی زێوچنی عەبا ف کنارهٔ سیم‌باف عبا.

**سورمەیی:** بەرەنگی سورمە، کلی ف سرمه‌ای رنگ.

**سورنا:** زوڕنا ف سرنا.

**سورناتك:** زوڕناتك ف گیاهی است دارویی.

**سورناژەن:** زوڕناژەن ف سرنانواز.

**سوُرنجان:** گیایەکە بۆ دەرمان دەشێ ف گیاه سورنجان.

**سۆرنگ:** رەگی گیایەکە بەن‌و خامی پێ سوُر دەکەن، رۆنیاس ف روناس.

**سوروشت:** سروشت ف سرشت، طبیعت.

**سوروشتی:** سروشتی ف طبیعی.

**سوُروکردن:** سوُرکردنەوە ف نگا: سوُرکردنەوە.

**سوُرونه:** گیایەکە ف گیاهی است.

**سۆره:** ۱) منـاڵی هەوێ بۆ ژنی هەوێدار؛ ۲) وێدەچی، رەنگـە، دوُرنیە، ئەشێ؛ ۳) خزمی بەمل‌داهاتوی رەزاگران؛ ۴) جۆرێ هەنجیری سوُر ف ۱) بچـۀ هوو؛ ۲) ممکن است؛ ۳) فامیل مزاحم و گرانجان؛ ۴) نوعی انجیر قرمز.

**سوۆره:** زوۆره ف صدای گریۀ خشن.

**سوُره:** چڕوچاوسوُر ف سیماسرخ.

**سوُرۆه:** خول، چەرخ ف چرخش، چرخه.

**سوُرەباڵە:** زرەکەو ف نگا: زرەکەو.

**سوُرەبـان:** ناوی گونـدێکـە کە جێگـەی چاپخانەی شورشی کوردبوُ بەعسی ویرانی‌کرد ف نام دهی است محل چاپخانه نهضت کُرد که بعثیان ویران کردند.

**سوُرەبنه:** گیایەکە بۆ دۆکلیو، سوُراو ف گیاهی است دردوغبا کنند.

**سوُرەبی:** جۆرێ داربی ف نوعی بید.

**سۆرەپەن:** باڵدارێکی پێ بەپەڕی سوُرو سپیە ف پرنده‌ایست آبزی.

**سوُرۆەت:** ۱) بەندێ لە قورعان؛ ۲) چارەگە لیره؛ ۳) سیایی ف ۱) سورۀ قرآن؛ ۲) سکۀ کوچك از طلا؛ ۳) لیست، سیاهه.

**سوُرەتا:** ۱) تای سێ رۆژە، نۆبەتێ کە سێ‌رۆژ پیاو بەرنادا؛ ۲) سوُریژه ف ۱) تب سەروزه؛ ۲) سرخجه.

**سوُرەتاو:** گەرمایی بەتەوژمی خۆر ف آفتاب گرم.

**سوُرەچنار:** چناری جەوهەردار ف چنار.

**سوُرەچێو:** جۆرێ دەوەنەدار ف درختچه‌ایست.

**سوُرەداڵ:** خەرتەلی ئاماڵ‌سوُر ف نوعی لاشخور.

**سوُرەدزه:** ناوی گوندێکە ف نام دهی است.

**سوُرەزرته:** موُزەڕدی چاوشینی ناحەز ف مو زرد چشم آبی بدقواره.

**سوُرەساقه:** بێچوەچێشکەی توُك لێ‌نەهاتو ف جوجه پرندۀ پر درنیاورده.

**سوُرەساو:** سێوەسوُرە ف سیب سرخ.

**سۆرەسۆر:** زۆرەزۆر ف نگا: زۆرەزۆر.

**سوُرەسەقەته:** سوُرەساقە ف نگا: سوُرە ساقە.

**سوُرەشامی:** جۆرێ ترێ، جۆرێ هەنگور ف نوعی انگور.

**سوُرەقانگ:** جۆرێ مراوی سوُرو سپیە ف نوعی مرغابی.

**سوُرەقـــورینـگ:** بالـدارێکی لاق‌و دنـدوُك سوُری بەرزەبـالایە ف پرنده‌ای است.

**سۆرەك:** لێدان‌و کوتانی زۆر بەئازار ف کتك‌کاری جانانه.

**سوُرەکوان:** جۆرێ زیپکەی گەورەی سەر سوُرە ف نوعی جوش بزرگ بر پوست.

**سوُرەکەروێشك:** کەروێشکی سوُرباو ف خرگوش سرخ‌فام.

**سۆرەگوڵ:** گوڵی سوُر ف گل‌سرخ.

**سوُرەماسی:** قاشە، جۆرێ ماسی ف شبوط، نوعی ماهی.

**سۆرەمزه:** جۆرێ مێشی درشتی سوُری چزودارە بە گاو گوێلکەوە دەدا ف نوعی زنبور نیش‌دار سرخ و درشت.

**سوُرەموز:** سۆرەمزە ف نگا: سۆرەمزە.

**سوُرەموزه:** سۆرەمزە ف نگا: سۆرەمزە.

**سوُرەوبوگ:** سوُربۆوە، سوُرکراوە ف نگا: سوُرکراوە.

**سوُرەوبون:** سوُربوُنەوە ف نگا: سوُربونەوە.

**سۆرەوتۆره:** خزمی سەربارو بێکارە ف فامیلهای مزاحم و بیکاره.

**سوُرەو کریاگ:** سوُرکراوە ف نگا: سوُرکراوە.

**سوُرهول:** سوُرخوُل ف نگا: سوُرخوُل.

**سۆرەوەبو:** سوُربۆوە، سوُرکراوە ف نگا: سوُربۆوە.

**سوُرەوەبون:** سوُربوُنەوە ف نگا: سوُربوُنەوە.

**سۆرەوەرد:** مەڵبەندێکە لە کوردستان کە زۆر زانای بەناوبانگی لێ پەیدا بوە ف منطقۀ سهرورد.

**سوُرەوە کریاو:** سوُرکراوە ف نگا: سوُرکراوە.

**سۆرەویلك:** باڵدارێکە ف حواصیل.

**سوُرهـــەڵـگـــەڕان:** ۱) سوُربـــوُن لە شەرمـــان؛ ۲) رەنـگی سوُر بەسەرداهاتن؛ ۳) برێتی لە توُڕە بون ف ۱) سرخ شدن از شرم؛ ۲) به رنگ سرخ درآمدن؛ ۳) کنایه از خشمگین شدن.

**سوُرهەڵگەڕاو:** ۱) سوُربۆوە لەشەرمان؛ ۲) رەنگی سوُر بەسەرداهاتو؛ ۳) توُڕە ف ۱) سرخ شده از شرم؛ ۲) بەرنگ سرخ درآمده؛ ۳) خشمگین.

**سورهەڵگێڕان:** ۱) برێتی لە خەجاڵەت کردنەوە؛ ۲) برێتی لە کوشتن بە چەکی گەرم ف ۱) کنایه از شرمنده کردن؛ ۲) کنایه از کشتن با سلاح گرم.

**سوُرەهەراڵە:** گیایەکی بۆن خۆشە ف گیاهی است خوشبو.

**سوُرەیاو:** گرانەتا ف تیفوئید.

**سوُری:** سوُراتی ف سرخی.

**سۆری:** خەڵکی وڵاتی سۆران ف اهل منطقه «سۆران».

**سۆریاز:** سۆرپاز ف نگا: سۆرپاز.

**سۆریاس:** سۆرپاز ف نگا: سۆرپاز.

**سوُڕیان:** سوُڕان ف نگا: سوُڕان.

**سوُڕیانەوە:** سوُڕانەوە ف نگا: سوُڕانەوە.

**سۆری‌تاری:** سوُری تۆخ ف سُرخ تیره.

**سوُرێتی:** سوُراتی ف سرخی.

**سوُرێجه:** سۆرك، سوُرێژە ف سرخك.

**سوُریجه:** سوُرێجە، سوُرێژە ف سرخك.

**سوُرێچکه:** سوُرانچك ف خرخره، سرخنای.

**سوُرێژکه:** سۆرك، سوُرێژە ف سرخك.

**سوُرێژه:** سۆرك، سوُرێژکە ف سرخك.

**سوُريك:** سۆرك، سوُرێژه ف سرخك.
**سوُريكه:** سۆرك، سوُرێژه ف سرخك.
**سوُرێكه:** سۆرك، سوُرێژه ف سرخك.
**سۆری كەژ:** سوُری ئال ف سرخ روشن.
**سورين:** سمت، لاقوُن ف باسن، سرين.
**سوُرێن:** مەڵبەندێكە لە كوردستان ف ناحيەای در كردستان.
**سوُرێنچك:** سوُرانچك ف سرخناى، خرخره.
**سوُرێنچكه:** سوُرانچك ف سرخناى، خرخره.
**سۆرينگ:** رەنگ سوُر ف سرخ رنگ.
**سوُريەتی:** سوُرێتی، سوُراتی ف سرخی.
**سوُرێنه:** سوُرێنچك ف خرخره.
**سۆز:** ١) گفت، پەيمان، قەول؛ ٢) شادیو كەيف؛ ٣) گۆرانی خەمبار؛ ۴) پاشگری بەواتا: سوُتێن؛ ۵) سوُتاو بۆدڵ دەگوترێ: (دڵسۆز) ف ١) قول و پيمان؛ ٢) شادی، كيف؛ ٣) آهنگ حزين؛ ۴) پسوند بەمعنی سوزان؛ ۵) سوخته كه با دل آيد.
**سۆزان:** سوُتان ف سوختن.
**سوُزان:** سوُتان ف سوختن.
**سوُزاندن:** سوُتاندن ف سوزاندن.
**سوُزانن:** سوُتاندن ف سوزاندن.
**سوُزانی:** ژنی بێشەرمو حەيا ف زن سليطه و بی‌حيا.
**سۆزرەت:** عەجايب، سەمەره ف عجيب.
**سۆزكردن:** گۆرانی بەسەبرۆكە گوتن ف ترنّم كردن.
**سوُزمانی:** سوُزانی، ژنی بێحەيا ف زن بی‌حيا.
**سوُزمه:** ١) برنج پاڵێوی كانزا، سماق پالان؛ ٢) چێشتی ماشو برنج ف ١) برنج پالا، شيپ پالا، آبكش؛ ٢) آش ماش و برنج.
**سوُزن:** دەرزی درێژو ئەستوُر بۆ جەواڵ دروُن ف جوالدوز.
**سوُزنه:** سوُتێن ف سوزنده.
**سۆزه:** ١) گۆرانی به دەنگی نزم، سۆز؛ ٢) تەزوُی سەرما؛ ٣) سر وەبا؛ ۴) سۆراخ كردنی خەبەر ف ١) ترنّم؛ ٢) سوزش سرما؛ ٣) نسيم؛ ۴) سرنخ از خبر.
**سۆزه كردن:** ١) به ئارامیو دەنگی نزم گۆرانی گوتن؛ ٢) شتێ لە خەبەر دەس كەوتن ف ١) ترنّم كردن؛ ٢) سراغ كردن خبر، بو بردن.
**سوُزەنەك:** نەخۆشيەكە لە جێگەی شەرمی نێر و مێ پەيدا دەبێ ف سوزاك، بيماری جنسی.
**سوُزەنی:** پارچەيەكی قوماشه ف پارچه‌ايست.
**سۆزی:** رۆژێ كه دادێ، سبەی، سبەينێ ف فردا.
**سوُزيا:** سوُتا ف سوخت، ماضی سوختن.
**سوُزياگ:** سوُتاو ف سوخته.
**سۆزيان:** سوُتيان ف سوختن.
**سوُزيان:** سوُتان ف سوختن.
**سوُزياو:** سوُتاو، سوُزياگ ف سوخته.
**سۆژان:** سوُتان ف سوختن.

**سۆژاندن:** سوُتاندن ف سوزانيدن.
**سوژده:** توێڵ نانەسەرزەوی بۆ گەورەتر ف سجده.
**سوُژن:** سوُزن ف جوالدوز.
**سوُژن ئاژن:** بەسوُژن كونكون كردن ف با جوالدوز سوراخ‌سوراخ كردن.
**سوُژندان:** كيسۆكەی چەرمين بۆ جێ سوُژن ف كيسهٔ چرمی جای جوالدوز.
**سۆژه:** ١) بێگار، سۆخره؛ ٢) دادوهاوار ف ١) بيگاری، سخره؛ ٢) فرياد و فغان.
**سۆژەك:** پێشكەی ورد، تۆفانه ف پشهٔ ريز.
**سوُژيان:** سوُتان ف سوختن.
**سوُژياو:** سوُتاو ف سوخته.
**سۆژين:** سوُژان، سوتان ف سوختن.
**سۆس:** ١) كەپەك، درشتەی سەر هێڵەك، كرپك؛ ٢) سوێسكه ف ١) نخاله؛ ٢) تيهو.
**سوُس:** گوندێكی كوردستانه بەعسی وێرانی كرد ف از روستاهای ويران شدهٔ كردستان بەدست بعثيان.
**سۆست:** ١) سۆس، كەپەك؛ ٢) سۆز، پەيمان، شەرت ف ١) نخاله؛ ٢) عهد، قول.
**سوستەم:** جۆرێ تفەنگی قەديم ف از تفنگهای قديمی.
**سوسرك:** كلۆ، كوله، كولله ف ملخ.
**سۆسرەت:** سۆزرەت ف عجيب.
**سۆسك:** ١) سۆس، كەپەك؛ ٢) باڵدارێكه لە جنسی كەو بەڵام بۆره ف ١) نخاله؛ ٢) تيهو.
**سوُسك:** باڵداری سۆسك ف تيهو.
**سۆسكه:** سوُسك ف تيهو.
**سوُسكه:** سوُسك ف تيهو.
**سۆسن:** گوڵێكه به چەند رەنگ دەبێ ف گل سوسن.
**سوُسن:** سۆسن ف گل سوسن.
**سوُسه:** بەگومان دۆزينەوەی نهێنی ف بو بردن از رازی، سراغ كردن.
**سۆسه:** ١) سوُسه؛ ٢) بای نەرم، سروه ف ١) نگا: سوُسه؛ ٢) نسيم، باد ملايم.
**سۆسه كردن:** سۆراخ كردن ف سراغ كردن.
**سوُسەلێ:** بزنی رەشی دەمو چاوسوُر ف بز مشكی رخسار قرمز.
**سوُسەمار:** مارمێلكەی درێژ ف سوسمار.
**سۆسەن:** سۆسن ف سوسن.
**سوُسەن:** سۆسن ف سوسن.
**سوُسەمبەر:** گيايەكی بۆنخۆشی گەڵاپانكەڵەی ددانەداره ف گياهی است خوشبو، سيسنبر.
**سوُسەنبەر:** سوُسەمبەر ف نگا: سوُسەمبەر.
**سوُسەنەك:** سوُزەنەك ف سوزاك.
**سۆسی:** سۆسك ف تيهو.

**سوُسێ:** ناوی گوندێکە ف نام دهی است.

**سوُش:** گیایەکی بۆن خۆشە ف گیاهی است خوشبو.

**سۆعبەت:** گاڵتە، گەمە ف شوخی، بازی.

**سوعوُتی:** سعوتی ف انفیە.

**سوعوُد:** سعود، بەخت ف بخت.

**سوغدو:** گیپە ف نگا: گیپە.

**سۆغرە:** بێگار، سۆخرە ف سخرە، بیگاری.

**سۆغین:** ئەنجامدان، پێك هانین ف انجام دادن.

**سۆفەقیتە:** مەلێکە ف پرندە‌ای است.

**سۆفی:** مریدی بێپرچی شێخان ف صوفی.

**سۆفیاوسافیا:** دو گوندی کوردستانی لای دیاربەکرن. زۆرتر پێکەوە *ناویان دەبرێ* ف نام دو روستای کردستان.

**سۆفیاتی:** مریدایەتی شێخان ف صوفی گری.

**سۆفیایەتی:** سۆفیاتی ف صوفی گری.

**سۆفیلکە:** ۱) ردێن داری سیس‌و کزو چکۆڵە؛ ۲) باڵدارێکی بۆرەڵوُکەی بەکاکۆڵە؛ ۳) جۆرێ کوولەی شینی پچوُك ف ۱) مرد ریشوی لاغر پژمردە؛ ۲) پرندە‌ایست خاکستری رنگ کاکل‌دار؛ ۳) نوعی ملخ سبز رنگ.

**سۆفیلە:** ۱) دەنکی درشتی ناو تەزبیح؛ ۲) دارێکە دەسەر تۆپی خەڕمانی رادەکەن ف ۱) دانهٔ درشت میان تسبیح؛ ۲) چوبی کە در بالای خرمن گذارند.

**سۆفیەقیتە:** قازەلاخ، باڵدارێکە لە چێشکە گەورەترەو پوپەی هەیە ف پرندە‌ای است.

**سۆڤ:** بەرانبەر سقکی، سەنگینی، قورسی، گران لە هەڵگرتن ف ثقل، سنگینی.

**سۆقان:** ئێسقان، بێشە، هەستی، ئێسك ف استخوان.

**سوُقان:** سۆقان ف استخوان.

**سۆك:** ۱) حینچکە؛ ۲) سقك لە کێش؛ ۳) دەنگی سەگ لە تاوکردنی دێڵدا ف ۱) کلەزدن در حین مقاربت؛ ۲) سبك‌وزن؛ ۳) صدای عاشقانهٔ سگ مقابل دلە.

**سوُك:** ۱) سقك، هاسان لە کێشا؛ ۲) زوُ، بلەز؛ ۳) بازار؛ ۴) بز، پەنجە بۆ کنگ‌بردن؛ ۵) حینچکە، لە پشت ژەنین؛ ۶) بێقەدر ف ۱) سبُك‌وزن؛ ۲) زود؛ ۳) بازار؛ ۴) انگلك؛ ۵) کلەزدن در هنگام جماع؛ ۶) آدم بی‌وقار.

**سوُکایەتی:** بێحورمەتی ف اهانت.

**سوُکبار:** بارسوُك ف سبکبار.

**سوُك پێوەدان:** خۆ پێوەنان، حینچکە لێدان ف کلەزدن در مقاربت جنسی.

**سوُك پێوە کردن:** بز پێوە کردن، ئەنگوست بۆقنگ بردن ف انگلك کردن.

**سوُکدان:** سوُك پێوەدان ف کلەزدن در مقاربت جنسی.

**سوُکدەس:** دەست سقك، دەست سوُك ف نگا: دەست سقك.

**سوکر:** پێسیر، مل، گەردن ف گریبان، گردن.

**سوکرە:** دیزە، مەنجەڵی لە گڵی سوُرەوە کراو ف دیزی، دیگ گلی.

**سوُك سوُکە:** نەخۆشیەکە ف آبلەمرغان.

**سوُك کردن:** ۱) لەکێش کەم‌کردن؛ ۲) آبڕو بردن ف ۱) سبك‌کردن؛ ۲) رسوا کردن.

**سۆك لێدان:** سوُك پێوەدان ف کلەزدن در جماع.

**سۆکن:** ماتەهەڵگرتنی کەو لەترس راوکەر ف مات شدن کبك از ترس شکارچی.

**سوکنا:** ئۆقرە ف آرامش.

**سۆکوم:** سەروسەکوت، بیچم، تەرح ف سیما.

**سۆکە:** ۱) سۆك، کوت پێوەدان؛ ۲) دەنگی سەگی سەر دێڵەبەبا ف ۱) کلەزدن در جماع؛ ۲) صدای عاشقانهٔ سگ.

**سۆکە سۆك:** ۱) لێ ژەنینی لەسەریەك، سوُك پێوەدانی بێپسانەوە؛ ۲) قروسکەی سەگ بۆ تاوکردنی دێڵ ف ۱) کلەزدن پیاپی در جماع؛ ۲) صدای عاشقانهٔ سگ.

**سوُکەلە:** چکۆلەی سوُك ف سبك کوچك.

**سوُکەڵە:** سوُکەلە ف سبك کوچك.

**سوُکەڵەخەو:** خەوی کەم‌و کاتی ف خواب سبك و موقتی.

**سوُکەلەسوار:** سوارچاك ف سوارکار ماهر.

**سوُکەڵەسوار:** سوارچاك ف سوارکار ماهر.

**سوُکەڵەناو:** ناوی پچوك کراو ف نام کوچك شدە، مخفّف.

**سۆکەند:** درکانی وتەیە بۆ باوەڕپێ کردن، سوند، سوێند ف سوگند.

**سۆکەندخواردن:** قسەی گومان لەدڵ دەرکردن ف سوگند یاد کردن.

**سۆکی:** ۱) سوُکی؛ ۲) ئامرازی ساوارکوتان ف ۱) نگا: سوُکی؛ ۲) ابزاری است شبیە هاون برای کوبیدن بلغور.

**سوُکی:** ۱) سقکی؛ ۲) بێئابڕویی ف ۱) سبك وزنی؛ ۲) رسوایی.

**سۆکین:** بناخە، بناغە، خیم، هیم ف اساس، بنا.

**سوڵ:** سڵ، رەوەك ف رموك.

**سوُل:** ۱) پلوُسك؛ ۲) ئاوهەڵدێر؛ ۳) سوڕك، حەوزۆکەی گەرماو ف ۱) ناودان؛ ۲) آبشار؛ ۳) حوضچهٔ گرمابە.

**سۆل:** ۱) پێڵاو، کەوش؛ ۲) کەوشی سوُکەڵەی بێپانیە ف ۱) کفش؛ ۲) دم‌پایی.

**سۆڵ:** ۱) پڕخوێ، خوێ‌واوی، سوُر؛ ۲) سەهوڵ، یەخ؛ ۳) پڕپۆ. تەنراوی قایم، پاش‌وشەی سفت دێ: (سفت‌و سۆڵ)؛ ۴) زۆر سپی: (سپی‌و سۆڵ و نەرم‌و نۆڵ) ف ۱) شور؛ ۲) یخ؛ ۳) سفت؛ ۴) سفید.

**سوُلا:** گیایەکی دەرمانە گوڵ‌زەردی گەلاپانە ف گیاهی است دارویی.

**سولاڤ:** ۱) ئاو هەڵدێر، تافگە؛ ۲) پلوُسك ف ۱) آبشار؛ ۲) ناودان.

**سۆلان:** رەسەن، عەسڵ، رەگەز ف اصل، نژاد.

**سۆڵان:** ۱) گوڵی پۆپەکەڵەشێرە؛ ۲) سوُزانی پێست ف ۱) گل تاج‌خروس؛ ۲) احساس سوزش در پوست.

**سوُلان:** گیایەکە بۆ دەرمان‌و لەوەڕ باشە، هەنگوان ف گیاه انگدان.

**سۆڵاندنەوە:** چوُزانەوە ف سوزش زخم و پوست.

**سۆڵانەوە:** چوُزانەوە ف سوزش زخم و پوست.

**سوُلاو:** سوُلاف [ف] نگا: سوُلاف.

**سوُلاوك:** سوُلاف [ف] نگا: سوُلاف.

**سوُلاوگە:** پلوُسك [ف] ناودان.

**سوڵبەند:** ۱) بەنی کەوش؛ ۲) نالبەند [ف] ۱) بند کفش؛ ۲) نعلبند.

**سوڵبەندان:** بەستەڵەك [ف] یخبندان.

**سولتان:** زاخە، کوُل، کویل [ف] زاغه.

**سولتان:** ۱) سان، پاڵشا؛ ۲) ئەسکوند [ف] ۱) سلطان؛ ۲) راست ایستادن شتالنگ.

**سولح:** ئاشتی، پێك هاتنەوەی دو دژ [ف] آشتی.

**سوڵدرو:** پێلاودرو [ف] کفشدوز.

**سوڵغە:** ناوی گوندێکە [ف] نام دهی است.

**سوُڵك:** ۱) پلوسك؛ ۲) گەرولەی ئاسیاو؛ ۳) برێتی لە منالی تازەزاو [ف] ۱) ناودان؛ ۲) ناودان گندم آسیا؛ ۳) کنایه از نوزاد.

**سوڵك:** سوڵ، کەوشی سوُکەڵە [ف] دمپایی.

**سوُلکە:** ۱) پاشماوەی تەنکی سابوُن؛ ۲) پاشماوەی وردی کەشك لەپاش سوُنەوە؛ ۳) برێتی لە ساوا [ف] ۱) ته‌ماندهٔ صابون؛ ۲) ته‌ماندهٔ کشك بعد از ساییدن؛ ۳) کنایه از نوزاد.

**سوڵکەر:** پێلاودرو، کەوشدرو [ف] کفشدوز.

**سولگە:** جێگەی لێژو خز [ف] نشیب لیزگاه.

**سوڵوخوا:** سور، سوڵ [ف] شورمزه.

**سولوسات:** ۱) سوُروسات؛ ۲) حەشاماتو ئاپوّرە [ف] ۱) سیورسات؛ ۲) جمعیت زیاد.

**سوڵوڵە:** بەچکە دوپشك، پێچوی دمارە کوڵ [ف] بچه عقرب.

**سولە:** ۱) سنگی داوێنی رەشماڵ؛ ۲) بەڵمی هەرزنو چەڵتوُك [ف] ۱) میخ چوبی بر دامنهٔ چادر؛ ۲) کاه ارزن و شالی.

**سوڵە:** هەڵاش، چرپیو گیا بوّ بن قورەبان [ف] گیاهی که زیر گل اندود بام گذارند.

**سوڵە:** ۱) بەستەڵەك؛ ۲) سەرمای توند؛ ۳) بڵێسە؛ ۴) چڵکدانی ئەندام؛ ۵) ناوی چەند گوندێکە لە کوردستان؛ ۶) چوُزانەوەی پێست؛ ۷) جوّرێ دوُپشکی پچوُك؛ ۸) تروسکەی لە دوُر [ف] ۱) یخبندان؛ ۲) سرمای سخت؛ ۳) شعله؛ ۴) تپش عضو از درد؛ ۵) نام چند روستا؛ ۶) سوزش پوست؛ ۷) نوعی کژدم ریز؛ ۸) سوسو زدن.

**سوڵەچرا:** چوڵەچرا، خەتیرە [ف] مشعل چوبی.

**سوڵەرمە:** چلوُرە، شیشەسوڵ [ف] دنگاله.

**سوڵەسوڵە:** ۱) چوُزانەوە لە پێست یان لە زمانەدا؛ ۲) جوّرێ دوپشکی ورد [ف] ۱) سوزش پوست و زبان؛ ۲) نوعی کژدم ریز.

**سوڵەکە:** لوّرکی سوڵ [ف] محصول نمکین تیزآب پنیر.

**سولی:** کای هەرزنو چەڵتوُك، بەڵم [ف] کاه ارزن و شالی.

**سوُلی:** جەرگو ناو، دڵو گورچیلەو جەرگ [ف] دل و جگر و قلوه.

**سوڵیانەوە:** چوُزانەوە [ف] به سوزش آمدن پوست.

**سوُلی کەباب:** جەرگودڵی برژاو [ف] کباب جگر و قلوه.

**سولێن:** ژێراو [ف] زیراب.

**سوڵینە:** ۱) گونجە، وشترگەڵو، ریگە ئاوی لە سواڵەت؛ ۲) خونچە [ف] ۱) تنبوشه، آبراه سفالین؛ ۲) غنچه.

**سوڵینەوە:** سوزیانەوەی پێست، چوُزانەوە [ف] بەسوزش آمدن پوست.

**سوّما:** ۱) روّناکی چاو، هێزی دیتن؛ ۲) ئاسوّ؛ ۳) تروسکەی روُناکی لە دور؛ ۴) مەڵبەندێکە لە کوردستان [ف] ۱) سوی چشم؛ ۲) افق؛ ۳) سوسو زدن روشنایی؛ ۴) منطقه‌ای در کردستان.

**سوّمایی:** ۱) هێزی چاو، بینایی؛ ۲) رەشکێنە [ف] ۱) نیروی دید؛ ۲) مردمك چشم

**سوّمایی داهاتن:** برێتی لە کوێر بوُن [ف] کنایه از نابینا شدن.

**سون:** ۱) سن، بەڵای گەنم؛ ۲) سنوی سەگ [ف] ۱) سن آفت گندم؛ ۲) بلوغ سگ.

**سوّن:** شیاکە، ریخ، سنێر [ف] سرگین.

**سوُن:** ساوین [ف] سودن

**سوّنت:** کون [ف] سوراخ.

**سوّنتن:** سمین [ف] سوراخ کردن.

**سوّنج:** گوندێکە [ف] روستایی است.

**سوُند:** سوّکەند [ف] سوگند.

**سوّند:** سوّکەند [ف] سوگند.

**سوندروك:** تابوُت [ف] تابوت.

**سوندریك:** تابوُت، داربەست، سوندروك [ف] تابوت.

**سوّنْك:** خوّڵی زوروورد [ف] گرد و غُبار.

**سونکە:** سُولکە [ف] نگا: سوُلکە.

**سوّنکە:** ۱) سولکە؛ ۲) هەل، دەرفەت [ف] ۱) نگا: سولکه؛ ۲) فرصت، فراغت کار.

**سوّنگە:** لەبەر، بەهوّی، هوّ [ف] سبب، وسیله، به‌سبب.

**سونگە:** دەرفەت، هەل، سوّنکە [ف] فراغت، فرصت.

**سونگەر:** هەوری [ف] اسفنج.

**سونگی:** نێزە [ف] نیزه.

**سونگی تاق:** شەڕی سەرنێزە [ف] جنگ سرنیزه.

**سوننەت:** ۱) خەتەنە؛ ۲) نوێژی نەواجب [ف] ۱) ختنه؛ ۲) نماز سنّت.

**سوننەتە:** ناوی گوندێکە [ف] نام دهی است.

**سوننی:** ۱) نێزە؛ ۲) موسوڵمانی جگە لە شیعە [ف] ۱) نیزه؛ ۲) پیرو مذاهب تسنّن.

**سوننی تاق:** سونگی تاق [ف] جنگ سرنیزه.

**سوّنە:** نێرەمراوی، سەرکەسك [ف] مرغابی نر.

**سوُنەت:** خەتەنە [ف] ختنه.

**سوّنەقیرك:** باڵدارێکی ئاوییە [ف] نوعی مرغابی.

**سوُنەوە:** ساوین [ف] ساییدن.

**سونێ:** گوندێکە [ف] روستایی است.

**سوّوور:** پەڵخور، کای خوراوی ناوزگی ئاژەڵ [ف] کاه هضم نشده در شکم حیوان.

**سووّری:** سموّرە [ف] سمور.

**سۆوری:** نێری پێشەنگ، ڕەمکێشی گەلە ف نخراز، پیشاهنگ گله.
**سوە:** ۱) ڕۆژێ دادێ، سبەی؛ ۲) کاڵ، خاو، نەگەیشتو؛ ۳) نەمام، ریشەی چەقـانـدن؛ ۴) جۆرێ سەرپێچو مێزەرەی ژنـان؛ ۵) برێتی لە منالی ساوای خۆشەویست ف ۱) فردا؛ ۲) کال؛ ۳) نهال؛ ۴) نوعی عمامۀ زنانه؛ ۵) کنایه از نوزاد عزیز.
**سوهان:** سنێر شیاکە، ریخ ف سرگین.
**سۆهـانـە:** هۆزو تیرەیەکـی کوردی یەزیدیە لە سوریە دەژی ف از فرقەهای مذهبی کُردزبان در سوریه.
**سۆهتن:** سوُتان ف سوختن.
**سوهر:** سوُر، سۆر ف سرخ.
**سوهراف:** سۆراف، سوُراو ف غازه، سرخاب.
**سوهرْك:** سۆرك، سوُرێژە ف سرخك.
**سۆهری:** سوُرایەتی ف سرخی.
**سوهرێچْك:** ۱) کرکراکە، سوُرانچك؛ ۲) کونی قوُن ف ۱) سرخنای، خرخره؛ ۲) مقعد.
**سوهن:** سام، ساو، ترس، عەیبەت ف خوف، ترس.
**سوەی:** سبەی ف فردا.
**سوەیل:** ئەستێرەیەکە ف ستارۀ سهیل.
**سوێ:** ۱) سوُی، داخو عەزرەت؛ ۲) تاسـە؛ ۳) نزیك؛ ۴) ئاسـۆ؛ ۵) تمـاشـا؛ ۶) سارێژبـوُنی برین؛ ۷) ئازار، ژان ف ۱) حسـرت؛ ۲) اشتیاق؛ ۳) نزدیك؛ ۴) افق؛ ۵) نگاه؛ ۶) التیام زخم؛ ۷) درد و آزار.
**سوُی:** داخو عەزرەت، سو ف حسرت و درد.
**سوُیاگ:** سواو ف ساییده.
**سوُیان:** سوان ف ساییده شدن.
**سوێبوُنەوە:** ۱) غەم خواردن بۆ کەسێك؛ ۲) مردن لە خەمان ف ۱) غم خوردن برای کسی؛ ۲) از غم مردن.
**سویتلی:** سوتلی ف همسر موقّتی بدون نکاح.
**سوێتـە:** ۱) لەمپـەرو پەرژینی کەوپـەڕ؛ ۲) چێشتـەی نچیر؛ ۳) تەپکە کەروێشـك ف ۱) مانعی که در راه کوچ کبکان می گذارند؛ ۲) طعمۀ شکار؛ ۳) گودال تله خرگوش.
**سوێتەلی:** خوێڕی و بێکارە ف بیکاره و هرزه.
**سوێجگەر:** سوجگەر ف دل و قلوه.
**سوێدار:** خەمبار، ئازیەتبار ف عزادار.
**سوێر:** ۱) سوێڵ، سوُر، سوێڵەخوا؛ ۲) تامەزرۆ، بەئارەزوبو شتێ: (**سوێر ئاو** واتا: تینو) ف ۱) شورمزه؛ ۲) آرزومند برای چیزی.
**سوێڕ:** سوُر لەسەر مەبەست، پێ چەقێن ف پافشاری کننده، مصّر.
**سوُیر:** ۱) سوُر، سۆر، سوهـر؛ ۲) بەزمو میوانداری، سوُر، سوُران؛ ۳) گەرم، داخ ف ۱) سرخ؛ ۲) جشن و سور؛ ۳) گرم، داغ.
**سوێراو:** سەرچاوەی ئاوی سوێر: (ئەم کانیە **سوێراوە**) ف چشمۀ آب شور.
**سوێرخوێ:** زۆر خوێ تێکراو، زۆر سوێر ف بسیار شورمزه.
**سوێرکە:** ۱) سوێرە؛ ۲) کاکڵەبادامو تۆمو شتی برژاو ف ۱) نگا: سوێرە؛ ۲) آجیل.
**سوێرو:** ڕەشۆڵە، ریشۆڵە، گاوانی ف سار.
**سوێرە:** دەم گەڕانـدنی ئاژەڵ بۆ سوێر: (مـەڕەکـان **سوێرە** دەکـەن) ف اشتیاق دام برای نمك.
**سوێرەکە:** ۱) چێشتێ کە لە تۆراخی دەکەن؛ ۲) جۆرێ مازو ف ۱) آش از دوغ چیکده؛ ۲) نوعی مازوج.
**سوێرەڵوك:** سوێری نیوەتاڵ ف شور مایل به تلخی.
**سوێرێژك:** سۆرك، سوُرێژە ف سرخك.
**سوێس:** تارمایی، ڕەشایی لە دورەوە هاتنە بەرچاو ف شبح.
**سوێسکە:** سوُسك، سویسکە، باڵدارێکی گۆشت خۆشە ف تیهو.
**سوێسکەیی:** جۆرێ هەڵپەرکێ ف نوعی رقص.
**سوێسن:** گوڵێکە زۆر بۆنخۆش، سۆسن ف سوسن.
**سوێسنایەتی:** مەڵبەندێکە لە کوردستان ف ناحیه‌ای در کردستان.
**سوێسنە:** سۆسن ف سوسن.
**سوێسنی:** خەڵکی سوێسنایەتی ف اهل منطقۀ «سوێسنایەتی».
**سوێگە:** ئاسۆ ف افق.
**سوێل:** سمبێل، سمێڵ ف سبیل.
**سوێڵ:** سمبێل ف سبیل.
**سوْیل:** ۱) سقیل؛ ۲) پلوسك؛ ۳) تاڤگە ف ۱) نگا: سقیل؛ ۲) ناودان؛ ۳) آبشار.
**سوُیل:** سمبێل ف سبیل.
**سوُیلاڤ:** تاڤگە، ئاوهەڵدێر ف آبشار.
**سوین:** سوُن، سوُنەوە ف ساییدن
**سوێن:** سوُند، سۆند، سۆکەند ف سوگند.
**سوێند:** سوُند، سۆکەند ف سوگند.
**سوێنـدخـۆر:** ۱) هاوپـەیمـان؛ ۲) کەسێ کە سوُنـدێ دخـۆت ف ۱) همپیمان؛ ۲) سوگند یادکننده.
**سوێندکاری:** پەیمان بەستنی بەکۆمەڵ ف پیمان دسته‌جمعی.
**سوێنـدگـر:** کەسێ لە سوێنـدی بەدرۆ تۆشی بەڵا بوُبێ ف بلا دیده از سوگند دروغین.
**سوێنکە:** بەرماوی ورد لە سابوُن یان کەشك، سونکە، سۆنکە ف تەماندۀ صابون و کشك ساییده.
**سوێنە:** تەشتی سواڵەتی، تەشتی گڵێنە ف تشت سفالین.
**سوێیە:** سبەی ف فردا.
**سوُیە:** سپڵ ف طحال.
**سوُیین:** سوانەوە، تیژکردنی تیغ بە هەسان ف با فسان تیغ را تیز کردن.
**سە:** ۱) سپڵۆت، بەشـدار، چوارپێ، سپـەڕ؛ ۲) پاشگـری خەبـەردان: (واسـە) ف ۱) سگ؛ ۲) پسوند خبری، است.
**سە:** سڵو قوشقی، دڵئێشاو، ڕەنجاو ف آزرده، رنجیده.
**سەب:** تاو، وچان، جارێ بە ئەمانەت: (باران **سەب** وەستایە) ف موقتاً.
**سەبـا:** ۱) لەبـەر، بۆ خاتـری: (**سەباتە** هاتم)؛ ۲) بەرەبەیان: (**سەبای** ساڵحان)؛ ۳) بەیانی، سۆزی ف ۱) برای، بخاطر؛ ۲) بامداد؛ ۳)

فردا.

**سەبـارەت:** ١) لەبەر، بۆ خاتری، سەبا: ٢) دەربارەی، لەمەڕ ف ١) از برای، بخاطر؛٢) راجع، درباره.

**سەبر:** ١) حەوسەلە، پشولەسەر خۆیی؛ ٢) هێدی، نەتوند؛ ٣) زبڵ‌و زاڵی ماڵ؛ ٤) پژمـە لە سەرەتای کار یان سەفەر ف ١) شکیب؛ ٢) یواش، اهسته؛ ٣) آشغال؛ ٤) عطسهٔ شگون.

**سەبرگە:** زبڵدان ف آشغالدان.

**سەبرگەچی:** زبڵ‌ماڵ، کۆڵان‌ماڵ ف آشغالی، رفتگر.

**سەبرهاتن:** ١) پژمین لە دەست پێ کردنی کارێکا؛ ٢) سەبوُری هاتن ف ١) عطسهٔ شگون؛ ٢) صبوری.

**سەبز:** رەنگێکە لە نێوان زەردو عاسمانی‌دا، کەسك ف رنگ سبز.

**سەبـــزە:** ١) مرۆی سپی‌پێستی ئامـاڵ‌زەردی جوان، زەری؛ ٢) جۆرێ کشمیش ف ١) آدم سبزەرنگ؛ ٢) نوعی کشمش، سبزه.

**سەبل:** پشتێڕ، گەوڕ، تەوێڵە ف اصطبل.

**سەبنێسی:** نەخۆشیەکی سەگە ف یکی از بیماریهای سگ.

**سەبۆچی:** لەبەرچی؟ ف برای چه؟.

**سەبوُری:** ئارام‌بوُنی دڵ لە کاتی خەم خواردندا ف صبوری.

**سەبوُن:** بای زۆر گەرمی گیاندارکوژ، گڕەبا، گڕە: (مەزرەعەی هەستیم وای **سەبوُن** بەردەن) «مەولەوی» ف بادسام.

**سەبەب:** هۆ، سۆنگە، سەمەد ف سبب.

**سەبەت:** دەفری لەتوُل تەنیاو ف سبد.

**سەبەتانە:** سێرەی تفەنگ ف مگسهٔ تفنگ.

**سەبەت‌چن:** کەسێ کە سەبەت دروست دەکا ف سبدباف.

**سەبەتولکە:** سەبەتی پچوُك ف سبد کوچك.

**سەبەتە:** سەبەت ف سبد.

**سەبەتە بەسەرێ:** بازیەکی بچوُکانە ف نوعی بازی کودکان.

**سەبەتەچن:** سەبەت‌چن ف سبدباف.

**سەبەل:** نەخۆشیەکی چاوە ف چشم‌درد، سبل.

**سەبەڵ:** سەبەل ف چشم‌درد، سبل.

**سەبیل:** ١) سبیل، ئامرازی توُتن کێشان؛ ٢) ئاوی خێرێ ف ١) چپق؛ ٢) آبی که به احسان دهند.

**سەبیل‌تێ کەر:** برێتی لە درۆزنی زل ف کنایه از دروغگو.

**سەبیلچی:** سەبیل‌ساز، کەسێ سبیلی توَتن دروست دەکا ف چپق‌ساز.

**سەبیلخۆر:** کەسێ کە توتن بە سەبیل دەکێشێ ف چپق‌کش.

**سەبیل‌ساز:** سەبیلچی ف چپق‌ساز.

**سەبیل کێش:** سەبیل‌خۆر ف چپق‌کش.

**سەبێلە:** ١) سەبیل، ئامرازی توتن‌کێشانی لە قوڕ؛ ٢) ئاسنێ کە دەسەر بۆڕی ئاوی دەگرن ف ١) چپق؛ ٢) گیرهٔ سر لولهٔ آب.

**سەپـان:** ١) رەنجبـەری دەستـەبـەر کە لە پێنـج‌بەش بەشێك لە بەهرە دەگرێ؛ ٢) بەزۆر توُش کردن ف ١) کارگر کشـاورزی که یك پنجم بهره می‌گیرد؛ ٢) تحمیل.

**سەپاندن:** بەزۆر توُش کردن، بەملدا هێنان، داسەپاندن ف تحمیل کردن.

**سەپـانی:** ١) کاری سەپان؛ ٢) بەهرەیێ کە بە سەپان دەگا ف ١) کار زراعت در مقابل یك پنجم محصول؛ ٢) مزد «سەپان».

**سەپتْك:** ١) بەردی کە دە جادە دەگیرێ؛ ٢) جۆگەئاوی داپۆشراو ف ١) سنگ سنگ‌فرش؛ ٢) مجرای سرپوشیده.

**سەپك:** ١) ئامرازی پۆی چادر کوتان؛ ٢) کولێرەی ئەستوُر لە درشتەی ئارد بۆ سەگ، سەولـە، خەپلە ف ١) ابـزار پودکوبی چادربافان: ٢) نواله از نخاله برای سگ.

**سەپکـە:** ١) کولێرەی لە درشتـەئـارد، سەپك؛ ٢) ژنەك ف ١) نواله از نخاله؛ ٢) قشو.

**سەپۆل:** حەپۆل، گێلۆکە ف پخمه.

**سەپۆلە:** سەپۆل ف پخمه.

**سەپەکە:** سە، بەشدار، چوارپێ، سپەڕ، سپلۆت ف سگ.

**سەپەل:** ١) سەپۆل؛ ٢) سپڵ ف ١) پخمه؛ ٢) طحال.

**سەپەلیك:** ١) جەرگی سپی، جێگەی هەناسە دان لە دەروندا؛ ٢) قلیان، قلیاناوی ف ١) ریه، شش؛ ٢) قلیان.

**سەپی:** پالاوتە، پاڵێوراو ف پالیده.

**سەت:** ژمارەی دوای نەوەتونۆ ف صد.

**سەتـرل حەمـام:** پارچـەیەکـە لەبـەر تاو بە چەنـد رەنگ دەنوێنێ ف پارچەایست که در آفتاب به چندین رنگ دیده می‌شود.

**سەترنج:** گەمەیەکە بە شازدە داش دەکرێ لە تیرەی گەمەی دامەیە ف شطرنج.

**سەترە:** زللە، زلە ف سیلی.

**سەتك:** گیایەکە بەری لە نۆك دەچی‌و بە شینی دەخورێ، سەیدوُکە ف گیاهی است.

**سەتکا:** هەرچەند، ئەگەرچی ف هرچند.

**سەتڵ:** پەقرەج ف سطل.

**سەتڵ‌وجەم:** نەخۆشی «ذات‌الجنب» ف ذات‌الجنب.

**سەتم:** داڕوُخان ف فروریختن خاك.

**سەتمـاندن:** ١) پڕ کردنەوەی چاڵ؛ ٢) ڕوُخاندنی دیوار ف ١) خاك در چاله ریختن؛ ٢) فرو ریزاندن دیوار.

**سەتمە:** ساتمە ف سکندری.

**سەتە:** ١) برێتی لە چەرخێ، سەدساڵ؛ ٢) سوکەڵەناوی سەتار ف ١) سده، قرن؛ ٢) مخفّف نام ستّار.

**سەجەرە:** رەگەزنامە، نوسراوی ناوی باب‌و باپیران ف شجره‌نامه.

**سەچت:** وردبوُنەوەو گەڕیان بە شوێن شتێکا ف تفتیش.

**سەچتین:** پشکنین ف تفتیش کردن.

**سەح:** ١) پێ زانین، ئاگایی: (من ئەو خەبەر سەح نەکریە)؛ ٢) بەوردی لێ روانین: (دوختور سەح کرێ زارۆکێ من چبەلایە) ف ١) احساس کردن، شنیدن؛ ٢) معاینه.

**سەحات:** ١) سات؛ ٢) ئامرازی کات پێوان، کاژمێر ف ١) آن، وقت؛ ٢) ساعت.

**سەحکـردن:** ١) خەبـەرداربوُن، بیستن؛ ٢) تێ روانین بەوردی ف ١)

آگاه شدن، شنیدن؛ ٢) معاینه کردن.

**سەحکـەران:** هەستەکان (دیتن، چەژتن، بیستن، بێن، وێ کەوتن) ف حواس پنجگانه.

**سەحەت:** ١) سڵامەتی، ساقی، ساغی، ساخی؛ ٢) ئاسودە: (رەحمەت و **سەحەتم**)؛ ٣) رەنگ‌ورو: (پیاوێکی **سەحەت** خۆشە) ف ١) سلامت؛ ٢) آسوده؛ ٣) سیما، رخسار.

**سەحەر:** بەرەبەیان ف سحر، بامداد.

**سەحەری:** ١) لە کاتی سەحەردا: (سبەی **سەحەری** دەڕۆم)؛ ٢) جۆرە ئاهەنگێکە بە زوڕنا لێدەدرێ ف ١) هنگام سحر؛ ٢) آهنگی است که با سرنا نواخته می‌شود.

**سەحەن:** دەفری مسی هەراو بۆ چێشت ف تشت کوچك.

**سەخاوەت:** ١) دڵاوا؛ ٢) دڵاوایی ف ١) بخشنده؛ ٢) بخشندگی.

**سەخبیر:** چاوێر، ئاگادار ف مراقب، مواظب.

**سەخت:** ١) رەق، تونـد؛ ٢) دژوار؛ ٣) پێداگر و لاسار؛ ۴) سەرمـای بەتـەوژم ف ١) سخت، سفت؛ ٢) دشـوار؛ ٣) سختگیر، لجبـاز؛ ۴) سرمای شدید.

**سەختی:** ١) بنەمای وشەی سەخت؛ ٢) سپاردن، راسپاردن ف ١) صیغهٔ مصدری «سەخت»؛ ٢) سفارش.

**سەختیان:** ١) پێستی لە دەبـاغ‌دراو؛ ٢) سفـرەی چەرمی نانکـەر؛ ٣) زوێڵەچـەرم ف ١) پوست دبـاغی شده؛ ٢) سفرهٔ چرم نانوایان؛ ٣) برشی از چرم.

**سەخڵەت:** سخڵەت ف نگا: سخڵەت.

**سەخمـە:** ١) دارو پەردوی خانـوەروخـاو؛ ٢) دارێ کە بەر داری ترێی دەدەن؛ ٣) دارێکی بەگرێیە لە سێبـەرێدا مەشکـەو دۆدانـەی پێدا هەڵدەواسن ف ١) آوار؛ ٢) چوبی کە تاك بر آن تکیە دادە؛ ٣) چوبی است کە مشك را از آن می‌آویزند.

**سەخمەراتی:** ١) سەبەب، هۆ؛ ٢) ئەگەر ف ١) سبب؛ ٢) اگر.

**سەخناخ:** ١) سەختان، شوێنی سەخڵەت؛ ٢) ناوی کێوێك لە کوردستان ف ١) مسیر دشوار در کوه؛ ٢) نام کوهی در کردستان.

**سەخوڕ:** پەڵخوڕ، کای خوراوی ناو زگی حەیوان ف نگا: پەڵخوڕ.

**سەخوڕدان:** جێگەی سەخوڕ، ورگی حەیوان ف جای «سەخوڕ»، محل کاه هضم نشده در شکم حیوان.

**سەخورگە:** جێگەی سنێرلێ رشتن، گوفك، سەرانگوێلك ف شوله، سرگینگاه.

**سەخوڕمە:** مستەکۆڵە ف سقلمه.

**سەخۆرە:** توی سپی نزیك بە گەیشتن ف توت نارس.

**سەخەر:** ئابڕو، ناوی باش ف آبرو، خوشنامی.

**سەخەربرن:** ئابڕوبردن ف رسوا کردن.

**سەخەری:** سختیان، چەرمی ئەستوری لەدەباغ دراو ف ساغری.

**سەخی:** دڵاوا، بەخشندە ف بخشنده.

**سەخیر:** منداڵی بێباب، سێوی، هەتیو ف یتیم.

**سەد:** ١) بەربەندی ئاو؛ ٢) سەت ف ١) سدّ؛ ٢) صد.

**سەدا:** دەنگ، ئاواز: (**سەدا**ت دەر نەیە، **سەدا**یەکی خۆشی هەیە) ف صدا.

**سەدارە:** سدارە ف نوعی کلاه.

**سەدان:** چەند جار سەت ف صدها.

**سەددڵ:** دوڵ، دڕدۆنگ ف متردّد، دودل.

**سەدرابات:** گوندێکە ف نام دهی است.

**سەدری:** جۆرێ برنجی باش ف برنج صدری.

**سەدوسەد:** بریتی لە تەواو بێ کەمایەسی ف صددرصد.

**سەدە:** سەتە، بریتی لە سەد ساڵ، چەرخ ف سده، قرن.

**سەدەف:** شتێ رەقی سپی پێشەئاسایی لە زریادا، جێگەی تیاڕسکانی مرواری ف صدف.

**سەدەقـە:** ماڵ‌بەخشین لە ڕای خوادا. ئەموشەیە سەدیەکە بوە عەرەب کردویەتە سەدەقە ف صدقه، خیرات.

**سەدەم:** ١) دوای نەوەتـونـۆهەم؛ ٢) سەبا، بۆ خاتری ف ١) صدم؛ ٢) برای، بخاطر.

**سەدەمە:** بەڵا، ئازار، زیان ف صدمه، آسیب.

**سەدەمین:** سەدەم، دوای نەوەتو نۆهەم ف صدم.

**سەر:** ١) هەر شتێ لە باڵایە؛ ٢) لە ئەستۆ بەرەژوری گیاندار؛ ٣) یەکێ لە بزاوی پیت: (**سەر**و بۆرو ژێر)؛ ۴) پارەیێ کە باقی مامڵە دەدرێ؛ ۵) جار، دەحفە؛ ۶) ئالی، لا: (لەم **سەر** تا ئەو **سەر** چوم)؛ ٧) ماوەیەك لە زەمان: (**سەر**ێك هاتو رۆیشت)؛ ٨) داپۆشی دەفر؛ ٩) جەم، کن، نك: (بردومەتە **سەر** وەستا)؛ ١٠) تاکێك لە مرۆو ئاژەڵ: (دە **سەر** خێزانم، چوار **سەر** بزنم هەیە)؛ ١١) ئاخر، ئاکام: (هەتا **سەر**وا نامێنێ)؛ ١٢) بەخاتری، لەبەر: (لە **سەر**تۆ وام لێ هات) ف ١) هر چیز بالا؛ ٢) سر، کلّه؛ ٣) زَبَرِ اِعراب؛ ۴) پولی کە در معامله باقی دهند؛ ۵) بار، دفعه؛ ۶) طرف، سو؛ ٧) مدّتی از زمـان؛ ٨) سرپـوش ظرف؛ ٩) نزد؛ ١٠) واحد انسان و چهارپا؛ ١١) پایان، انجام؛ ١٢) برای، بخاطر.

**سهر:** ١) زڕ، بەدەڵ: (**سهر**داك)؛ ٢) بێبەر، بەرنەدەر ف ١) بدل؛ ٢) بی‌ثمر.

**سەرئەژمێر:** کەسێ کە تاك‌تاکی مرۆ یان ئاژەڵ حەسێب دەکا ف سرشمار.

**سەرئەژمێری:** کاری سەرئەژمێر ف سرشماری.

**سەرئەنجام:** بڕانەوەی کار ف سرانجام.

**سەرئەنداز:** ١) سەرپۆش، بەرانبەر ڕایەخ؛ ٢) ڕایەخی باریك کە کەنار دیوار پڕ دەکاتەوە ف ١) مقابل زیرانداز؛ ٢) زیراندازی مانند کناره.

**سەرئەنناز:** سەرئەنداز ف نگا: سەرئەنداز.

**سەرئێشان:** ژانەسەر ف سردرد.

**سەرئێشاندن:** بریتی لە جاڕزکردن ف دردسر دادن.

**سەرئێشە:** سەرئێشان ف سردرد.

**سەرئێوارە:** سەرەتای درەنگ‌بونی رۆژ ف عصر هنگام.

**سەرا:** ١) مـاڵی دیوان؛ ٢) جێگە: (**سەرا**ی دەوڵەتی، کاروانسە**را**)؛ ٣) ناوی گونـدێکە لە موکوریان ف ١) ادارهٔ مرکزی؛ ٢) جای؛ ٣) نام

دهی است.

**سەراپا:** لە سەر تا پێ، گشت لە گشت، هەمو ئەندام: (**سەراپای گوارە** زەردی ترس و لەرزە / ئەڵێی عاسی بوە لەو جێگە بەرزە) «**نالی**» ف سراپا.

**سەراپەردە:** دیوانی میر ف خانۀ فرمانروا.

**سەراپێ:** ١) سەراپـا؛ ٢) لەسـەرهـۆش، ئاگالێبوُن ف ١) سراپا؛ ٢) مواظب، متوجه.

**سەراپیتە:** بان لە دیو ی ژورەوە، بن میچ، میچ ف سقف.

**سەراراو:** کەفاوی تازە هێشتا شت پێ نەشۆراو ف کفابۀ نخستین برای رختشویی.

**سەرازا:** ئازاد ف آزاد.

**سەرازادی:** ئازادی، خۆبوُن، خۆی بوُن ف استقلال.

**سەرازایی:** سەرازادی ف استقلال.

**سەراســا:** ١) تایبـەتی؛ ٢) سەرانسـەر، گش ف ١) اختصـاصی؛ ٢) سراسر، همه.

**سەراسوێ:** لە بەرزترەوە ڕوانین بە نهێنی ف دزدکی از بالا نگاه کردن.

**سەراسەر:** گش، هەمو ف همگی.

**سەراسێ:** سەرێشە ف سردرد.

**سەراسیمە:** داماو، سەرگەردان ف سراسیمه.

**سەراشیت:** سەرێشەی چەل‌ومل و دەست بەرنەدەر ف سردرد مزمن.

**سەڕاف:** پوڵ گۆڕەوە، پارەفرۆش ف صرّاف.

**سەڕافی:** کاری پارەفرۆش ف صرّافی.

**سەراڤ:** ئاوێ کە دەگەڵ پیزە لەسکدایە ف آب همراه جنین در زهدان.

**سەراڤ پەقین:** رژانی ئاوی سەراڤ بەر لە هاتنی منالّ ف ریزش آب قبل از تولّد نوزاد.

**سەراڤك:** سەراڤ ف نگا: سەراڤ.

**سەراڤکانێ:** گەمەکردن لە ئاوی قوُڵ داو سەر دەئاو رۆکردنی یەکتر ف بازی هنگام شنا در آب.

**سەراڤکی:** ڕەپ‌وڕاست، بەئاشکرا، بێ‌دەروایسی ف رُك و صریح.

**سەراڤی:** دەغڵێك کە پاش بارانی پەڵە چێندراوە ف محصولی که پس از اوّلین باران تُند پاییزی کاشته شده باشد.

**سەراك:** کوڵکەی بەشانەکراو ف پشم و موی شانەزده و پاك شده.

**سەراگوم:** ١) بێ‌سەرو شوێن؛ ٢) کەس نەناس ف ١) گم بی‌اثر؛ ٢) گمنام.

**سەرامەت:** باوخۆشتر لە خەڵکی تر ف سرامد.

**سەرامەد:** سەرامەت ف سرامد.

**سەران:** ١) پیاو ماقـوُڵان؛ ٢) سلاّن، بڵندایيەکان، کێوان ف ١) سران قوم؛ ٢) بلندیها، کوهساران.

**سەڕان:** زەڕەی کەر ف عرعر.

**سەڕاندن:** زەڕەزەڕکردن ف عرعر کشیدن.

**سەرانسەر:** سەراسەر ف سراسر، همگی.

**سەرانگۆلك:** جێگەی لێ‌ڕشتنی پەین و ریخ، گوُفك ف شوله.

**سەرانگوێلك:** سەرانگۆلك ف شوله، سرگینگاه.

**سەرانوێلك:** سەرانگۆلك ف شوله.

**سەرانە:** پیتاك لە هەر تاکێ لە مرۆو ئاژەڵ ف سرانه.

**سەراو:** ١) چاوەی زلی ئاو؛ ٢) زەمینێ کە نزیك چەمە؛ ٣) سەراڤ؛ ٤) ئاودەست؛ ٥) زەمینێ کە زو ئاو قوُت نادات؛ ٦) هەر چی بنـاو نابێ وەك دار؛ ٧) ناوی گونـدێکـە ف ١) سرچشمـه؛ ٢) زمین نزدیك رودخانه؛ ٣) آب همراه جنین؛ ٤) مستراح؛ ٥) زمین‌رس که آب کمتر پذیرد؛ ٦) هرچه زیر آب نمی‌رود؛ ٧) نام دهی است.

**سەراوان:** دژی بناوان، لای سەرەوە ف طرف بالا.

**سەراوتۆقین:** سەراڤ پەقین ف ریزش آب همراه نوزاد.

**سەراوتەقین:** سەراڤ پەقین ف نگا: سەراڤ پەقین.

**سەراورد:** ڕابواردوُی پێشین ف گذشتۀ دور.

**سەراوەرد:** سەراورد ف گذشتۀ دور.

**سەراوی:** جۆرێ کوُلەکە: (کدو سەراوی) ف نوعی کدو.

**سەربادان:** برێتی لە ناڕازی‌بوُن ف کنایه از ناخشنودی.

**سەربار:** ١) شتێ کە لە سەر باری بارەبەر دادەنرێ؛ ٢) زەحمەتی زیادی ف ١) اضافه بار؛ ٢) قوز بالاقوز.

**سەربارانە:** باج‌سەندن لە بارەکانی کاروان ف باج گرفتن از بارهای کاروان.

**سەربارە:** سەربار ف نگا: سەربار.

**سەرباز:** چەکداری دەوڵەت ف سرباز.

**سەربازخانە:** بنکەی سەربازان ف پادگان.

**سەربازگرتن:** خەڵك بۆ سەربازی بردن ف سربازگیری.

**سەربازگیری:** سەربازگرتن ف سربازگیری.

**سەربازی:** چەکداری بۆدەوڵەت ف سربازی.

**سەرباس:** ئامانج لە گفتوگۆ ف موضوع صحبت.

**سەرباقی:** زیادە لەسەردانەوە لە گۆڕینەوەدا ف علاوه بر.

**سەربالّ:** پەڕی درشتی مەل ف شاهپر.

**سەربان:** دیو ی دەرەوەی سەرپۆشی خانو ف پشت‌بام.

**سەربدەو:** دوکولێو ی بەبرنج‌و ساوار ف آش بلغور و دوغ.

**سەربـڕ:** ١) کەسێ کە سەر دەبڕێ: (**لێم بۆتە میری سەربڕ**)؛ ٢) ڕێگە بواردن بۆ زوُ گەیشتن: (**ســەربـڕ ڕۆیشتم زوُ گەیشتم**) ف ١) جلاّد، سر بر؛ ٢) راه میان‌بر.

**سەربڕان:** سەر بە تیخ لە لەش جیا کرانەوە ف سر بریدن.

**سەربـڕانـە:** حەیوان کوشتنـەوەو میوانداری بەهۆی تەواوبوُنی کاری وەرزێری ف قربانی کردن و سوردادن بەمناسبت پایان کار کشاورزی.

**سەربڕاو:** سەر بە تیخ جیاوەکراو ف سر بریده.

**سەربردن:** ڕابواردن ف گذراندن، بسر بردن.

**سەربڕیاگ:** سەربڕاو ف سر بریده.

**سەربڕین:** سەر لە لەش جوێ‌کردنەوە بە تیخ ف سر بریدن.

**سەربزۆت:** داری نیوەسوُتاوی بەئاگر ف نیمسوز.

**سەربزۆك:** بزۆز، نەگونجاو ف ناآرام.
**سەربــزێو:** ۱) سەربزۆك؛ ۲) بریێتی لە ئەشقی، یاخی ف ۱) ناآرام؛ ۲) کنایە از متمرّد.
**سەربزێوی:** ئەشقی‌بوُن، یاخیەتی ف تمرّد، یاغیگری.
**سەربڵن:** ئابڕودارو لەسەر ف سرفراز.
**سەربڵند:** سەربڵن ف سرفراز.
**سەربڵندکردنەوە:** بریێتی لە راپەڕینو سەربزێوی کردن ف کنایە از تمرّد.
**سەربڵندی:** شانازی ف افتخار.
**سەربلوُر:** جۆرێ ماسی دەم درێژوکەی وەك بلوێر ف نوعی ماهی.
**سەربوُ:** سەربان ف پشت‌بام.
**سەربوُری:** بەسەرهات، سەرگوروشتە ف سرگذشت.
**سەربە:** لەمەڕ، لایەن‌گر: (کابرا **سەربە** دەوڵەتە) ف منسوب به، وابسته به.
**سەربەتاڵ:** ۱) دەفری بێ‌سەربۆش؛ ۲) پیاوی نەزانو بێ‌ئاوەز ف ۱) بی‌سرپوش؛ ۲) بی‌مغز و کودن.
**سەربەخۆ:** ئازاد، ئازا ف مستقلّ.
**سەربەخۆیی:** خۆی‌بوُن ف آزادی.
**سەربەدو:** چێشتی کەشك‌و گەنمە‌کوتاو ف آش کشك و گندم نیمکوب.
**سەربەدەرەوە:** بەدەنگ‌و ناو ف مشهور.
**سەربەردایی:** کەسێ بێ‌پرس کاری خۆی دەکا ف خودسر.
**سەربەرز:** سەربڵن ف سرفراز.
**سەربەرزکردنەوە:** سەربڵندکردنەوە ف شوریدن، یاغیگری.
**سەربەرزی:** شانازی بە کاری باش ف افتخار.
**سەربەرِسق:** خۆش‌بەخت، سەربەرۆزی ف خوش‌شانس.
**سەربەرۆُ:** جۆرێ مارە سەری وەك بەرۆُ دەچێ ف نوعی مار.
**سەربەرۆزی:** خۆش‌بەخت ف خوش‌شانس.
**سەربەرۆنە:** چێشتی دانەوێڵەی توند کە رۆنی بەسەر دا دەکەن ف آش غلیظ حبوبات که روغن داغ بر سر آن ریزند.
**سەربەرەخوار:** رو بەلای ژێرو ف سراشیب.
**سەربەرەخوارە:** بەرەژێر، سەربەرەخوار ف سراشیبی.
**سەربەرەژوُر:** بەرەوژوُرە، روُ بە باڵا ف سربالایی.
**سەربــەرەژێر:** ۱) سەربــەرەخــوار؛ ۲) شەرمــەزارو خەجــاڵەت ف ۱) سراشیب؛ ۲) سرافکنده.
**سەربەرەژێرکە:** بەرەوژێرە، سەربەرەخوار ف سراشیب.
**سەربەرەژێرە:** بەرەوژێرە ف سراشیب.
**سەربەرەوخوار:** سەربەرەخوار ف سراشیب.
**سەربەرەوخوارە:** سەربەرەخوار ف سراشیبی.
**سەربەرەوژوُر:** سەربەرەژوُر ف سربالایی.
**سەربەرەوژوُرە:** سەربەرەژوُر ف سربالایی.
**سەربەرەوژێر:** ۱) سەربەرەژێر؛ ۲) قڵپ ف ۱) سراشیبی؛ ۲) زیر و زبر.
**سەربەرەوژێرە:** سەربەرەژێر ف سراشیب.

**سەربەزێڕە:** نیسکێنەی توند کە رۆنی بەسەر دا دەکەن، لەب زێڕینە ف آش عدس غلیظ که روغن بر آن ریزند.
**سەربەس:** ئازاد ف آزاد.
**سەربەست:** سەربەس ف آزاد.
**سەربــەست کردن:** ۱) تەرخان کردن؛ ۲) نرخێ لەسەر ماڵی فرۆشیار دانــان کەبــۆی نەفــرۆشــێ ف ۱) آزاد گذاشتــن در هر کــاری؛ ۲) نرخ‌گذاری روی کالا طوری که به‌فروش نرسد.
**سەربەستە:** نهێنی، پۆشراوی نەزانراو ف پوشیده و پنهانی.
**سەربەستی:** ئازادی ف آزادی.
**سەربەسە:** سەربەستە ف پوشیده و پنهان.
**سەربــەسەر:** ۱) شت بەیەك وەگۆڕینی بێ باقی دانەوە؛ ۲) وەك یەك، بەرانبەر ف مبادلهٔ پایاپای، بی‌علاوه؛ ۲) برابر.
**ســەربەســەرە:** گان‌بەگان، دو نێــر کە یەکتر بگێــن ف مبادلهٔ دو همجنس‌باز.
**سەربەسەرێ:** سەربەسەرە ف مبادلهٔ دو همجنس‌باز.
**سەربەسی:** سەربەستی ف آزادی.
**سەربــەش:** کەسێ کە بەشی باش لە بەش کردندا هەڵبگرێ ف برندهٔ سهم خوب در تقسیم.
**سەربەکڵاوە:** مریشکی کاکۆڵدار ف مرغ کاکلی.
**سەربەگۆبەن:** مرۆێ کە دنەی خەڵك ئەدا ف تحریك‌کننده.
**سەربەگۆبەند:** مرۆی ماکی دنەدانی خەڵك ف تحریك‌کننده.
**سەربەگۆماکردن:** لەبەین بردن ف از میان بردن.
**سەربەگێچەڵ:** سەربەگۆبەند ف محرّك مردم.
**سەربەلك:** سەرگەڵای توتن ف نُخبهٔ برگ تنباکو.
**سەربەمۆر:** دەس لێ نەدراو ف دست‌نخورده، سر به‌مُهر.
**سەربەن:** بەندی کەوش‌و پێڵاو ف بند پای‌افزار.
**سەربەند:** ۱) چەند وشەیەك کە سەرەتای گۆرانی‌یە؛ ۲) بەستەی دوای مقــامو لاوك؛ ۳) گوتنێ لە گورانی‌دا کە لەپــاش چەنــد شێعــرێك دەگەڕێنــەوە سەری؛ ۴) سەردەستــە؛ ۵) سەرپــۆشی دەفری پچوك، قەپــاخ ف ۱) پیش‌درآمــد ترانــه؛ ۲) ترانهٔ سبك بعد از خواندن آواز کلاسیك؛ ۳) مرجع ترجیع‌بند؛ ۴) سردسته؛ ۵) سرهٔ ظرف کوچك.
**سەربەنگ:** سەربەلك ف نگا: سەربەلك.
**سەربەها:** نرخی خوێنی کوژراو، خوێن‌بایی ف دیه، خونبها.
**سەربەهەوێ:** ژنی پیاوی دوژنە ف زن هوودار.
**سەربێر:** ۱) کەسێ لەسەربێر ئاژەڵی دۆشەنی دەگرێ؛ ۲) یەکەم ئاژەڵ کە دێتــە دۆشــین لەبــێردا ف ۱) کســی که حیوان را برای دوشیدن می‌گیرد؛ ۲) اولین حیوانی که دوشیده می‌شود.
**سەربێش:** سەربەش ف نگا: سەربەش.
**سەرپا:** راوێستاو، وێساو ف ایستاده.
**سەرپاچ:** بژاردروُن لە ناو چەڵتوُك ف ویجین در شالیزار.
**سەرپاك:** تێکڕا، هەمو، گش ف همه، به‌کلّی.
**سەرپاڵە:** پێشەنگی درەو کەران ف پیشرو و دروگران.

**سەرپان:** جنۆکەی جادوگەران کەشتیان بۆدەهێنێ ف جنّ مسخّر جادوگر.

**سەرپایی:** ١) داوستەدی لەناو بازاڕا بێ دوکان؛ ٢) بریتی لە زگچوٗن؛ ٣) کەوشی سوکەڵەی بێپانیە؛ ۴) بەلەزو پەلەو بێڕامان ف ١) کسب و کار سرپایی؛ ٢) اسهال؛ ٣) دمپایی؛ ٣) باعجله، سرپایی.

**سەرپڕ:** ١) تژە؛ ٢) جۆرێ تفەنگی ڕاو ف ١) لبریز؛ ٢) تفنگ سرپر.

**سەرپزو:** پزو، جێگەدۆخین ف نیفه، جای بند تنبان.

**سەرپشك:** سەربەش ف نگا: سەربەش.

**سەرپنوم:** گوێرەپە، نەخۆشی بنانگوێ ئەستوٗربوٗن ف بیماری نکاف، اوریون.

**سەرپۆت:** کەسێ بە لەزو بێلێکدانەوە کار دەکا ف سطحی، سرسری.

**سەرپۆرت:** بەکاکۆڵ ف کاکل‌دار.

**سەرپۆش:** هەرچی شتی پێ لەبەر چاو نەدیو دەکەن ف سرپوش.

**سەرپەتی:** سەری بێ پۆشاك، سەررووٗت ف سر برهنه.

**سەرپـەڕ:** ١) ئەوپەڕی شت؛ ٢) ئێکەم لاپەڕی کتێب؛ ٣) شکڵی سەر تۆپەچیت ف ١) آنسوی؛ ٢) اولین صفحهٔ کتاب؛ ٣) عکس یا مارك پارچه.

**سەرپەرست:** کەسێ کە ئاگای لە شتێ یان کەسێ ئەبێ ف سرپرست.

**سەرپەرشت:** سەرپەرست ف سرپرست.

**سەرپـــەل:** ١) لقی بەرەژوٗری دار؛ ٢) سەر کردەی سی هەتـا پەنجـا پێشمەرگە؛ ٣) چاخی دەس پێکردنی بارانی پەڵە؛ ۴) نانێ کە لە سەر سکڵ ببرژێ ف ١) شاخه‌های بالایی درخت؛ ٢) سردستهٔ نظامی؛ ٣) موسم باران؛ ۴) نانی که بر اخگر بپزد.

**سەرپەڵە:** ١) جەنگەی بارانی پاییز؛ ٢) مانگی خەزەڵوەر ف ١) موسم باران پاییزی؛ ٢) آبانماه.

**سەرپـــەنجـە:** ١) سەری پێنـج ئەنگـوست بە تێکـڕایی؛ ٢) سەری تاکەئەنگوستێك ف ١) سرپنجه؛ ٢) سر یك انگشت.

**سەرپەنە:** قایمەمێو، داری ترێ کەداری وە بەر دراوە ف تاکی که با چوب دیگر محکم شده است.

**سەرپێ:** پەلە، لەز ف شتاب.

**سەرپێسپـاردن:** بریتی لە باوەڕی تەواو بەکـەسێ کردن ف کنـایه از اعتماد کامل به کسی داشتن.

**سەرپێچ:** ١) مێزەر، شاشك؛ ٢) یاخی، سەربزێو ف ١) عمامه؛ ٢) متمرّد.

**سەرپێچی:** سەربزێوی، ئەشقیایی ف تمرّد.

**سەرپێز:** جەژنی هەوەڵ حەیوان زان ف جشن زاییدن اولین گوسفند.

**سەرپێ کەتن:** ١) دارەدارەی زارۆك؛ ٢) چاك بوٗنـەوە لە نەخۆشی؛ ٣) پاش نابوٗتی سازبوٗنەوە ف ١) سر پا افتادن کودك؛ ٢) بهبود یافتن از بیماری؛ ٣) پس از سختی و عُسرت دوباره سرپا افتادن.

**سەرپێکەوەنان:** بریتی لە ژیان پێکەوە بردنەسەر ف کنایه از زندگی مشترك.

**سەرپیل:** شان، سەرمل ف کتف.

**سەرپێڵ:** ناوی شارێکە لە کوردستان ف سرپل‌زهاب.

**سەرپێوەنان:** بەکۆمەڵ بەرەوشتێ چوٗن ف رفتن گروهی به جایی.

**سەرپێیی:** ١) مامڵەی سەرپێیی؛ ٢) بەلەفیرە؛ ٣) زوٗی بەبێ ڕامان و دامان ف ١) کسب سرپایی؛ ٢) اسهال؛ ٣) باعجله و سرپایی.

**سەرتا:** ١) میوەی هەرەباش کە دەیخەنە سەر سەبەتەوە؛ ٢) سەربەنگ، سەرگەڵای توتن ف ١) میوهٔ نمونه که سر بار گذارند؛ ٢) نُخبهٔ برگ تنباکو.

**سەرتاپا:** هەمولەش، گش ف سراپا.

**سەرتاپێ:** سەرتاپا ف سراپا.

**سەرتاسەر:** سەرانسەر ف سراسر.

**سەرتاش:** ١) دەلاك، بەربەر؛ ٢) تیخی موٗتاش ف ١) سلمانی؛ ٢) تیغ موتراش.

**سەرتاشخانە:** دەلاکخانە ف دکان سلمانی.

**سەرتاشراو:** کەسێ موی سەری کورت کرابێتەوە ف سرتراشیده.

**سەرتـاشین:** ١) موی سەر کورت کردنـەوە؛ ٢) بریتی لە سوٗکـایەتی بەسەرژن هێنان ف ١) اصلاح سَر؛ ٢) کنایه از رسوا کردن زن.

**سەرتاشیاگ:** سەرتاشراو ف سر تراشیده.

**سەرتاق:** ١) دارەڕای سەر دەلاقە؛ ٢) بەنی بادراو کە بۆ جەواڵدروٗن بە جەواڵـیەوە دادەلــەقـێنن ف ١) چوبکهــای تیر طاقچــه؛ ٢) نخ جوالدوزی که به جوال آویزند.

**سەرتاڵ:** سەری هەودا دەزو ف سرنخ.

**سەرتانێ:** گوندێکە ف نام دهی است.

**سەرتراش:** سەرتاش ف سرتراش.

**سەرتقیرك:** سەرچکۆلە، بۆ تیزبەکەسێ کردن دێژنی ف سر کوچك، به متلك گویند.

**سەرتقلی:** ڕەت بردن و بەزەمیندا کەوتن ف سکندری خوردن و بر سر افتادن.

**سەرتـل:** ١) کڵاوی قوٗچی دروێشانە؛ ٢) کەپەنك، باڵتوی لباد ف ١) کلاه بلند دراویش؛ ٢) پالتوی نمدین.

**سەرتڵ:** هەڵبژێراو، هەرەباش، سەرتا ف برگزیده، بهترین.

**سەرتلی:** قوٗچەکە، هەنگولیسکی درومان ف انگشتانه.

**سەرتلیك:** ١) ڕەحاتی؛ ٢) قوٗچەکە، ئەنگوستیلەی درومان ف ١) قیف؛ ٢) انگشتانه.

**سەرتو:** توێژی سەر شیر و ماست ف چرابه، خامه، سرشیر.

**سەرتۆ:** سەرتو ف خامه.

**سەرتــۆپ:** یەکــەم لە جوانـی یان لە ئازایەتیدا: (فــڵان لەم ناوەدا سەرتۆپە) ف بی‌نظیر در زیبایی یا شجاعت.

**سەرتۆیز:** ١) کەرکۆڵ؛ ٢) سەرزل ف ١) گیاهی است؛ ٢) کلّه‌گنده.

**سەرتوٗتك:** جینچك، توٗتەکان ف چمباتمه.

**سەرتوٗژ:** نوٗك‌تیژ ف نُك‌تیز.

**سەرتوێ:** سەرتو ف خامه.

**سەرتوێژ:** سەرتو ف خامه.

**سەرتەرز:** شتێکە وەك دەزوۆ بە بڕکەی بێستانو داری ڕەزەوە دەبێ، تەرز ف نخ مانندی زرد بر تاك و بوتهٔ پالیزی.

**سەرتەریدە:** گەورەی دەستەی ڕێگران ف رئیس راهزنان.

**سەرتەریە:** سەرتەریدە ف رئیس راهزنان.

**سەرتەزێن:** ١) زۆرسارد؛ ٢) ناوی گوندێکە لای‌بانە ف ١) بسیار سرد؛ ٢) نام روستایی در کردستان.

**سەرتـەشی:** کەرتـەشی، گیایەکی سەرخڕی دڕکاویە ف نوعی خار از خانواده خار تاتاری.

**سەرتەڵ:** سەرتا، سەرتڵ ف برگزیده، نمونهٔ میوه.

**سەرتەنگ:** قایشێ کە بەسەر تەنگەی زیندا دێت ف نواری که بر تنگ زین آید.

**سەرتەنگێ:** گوندێکی کوردستانە بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان به دست بعثیان.

**سەرتەونە:** سەردارو بنداری تەونێ کە بەعەرزەوە دەکرێ ف چوبهای بالا و پایین دستگاه قالیبافی.

**سەرتیاچوُن:** برێتی لە بەیەکجاری فەوتان ف کنایه از نابود شدن.

**سەرتیپ:** گەورەی دەستە سواران ف رئیس تیپ سواره.

**سەرتیر:** ١) چینچکی گوان؛ ٢) ئاڵـــوداری درێژتـــر لە بان کە بوێتـە ئەنوایەك ف ١) نُك پستان؛ ٢) الوارهای بلندتر از سقف.

**سەرتیژ:** سەرتوُژ ف نُك تیز.

**سەرتێژ:** سەرتوُژ ف نُك تیز.

**سەرتێشت:** تاشت، نانی بەیانی ف چاشت.

**سەرتێکردن:** ١) سەرپێوەنان؛ ٢) ماڵ بەخت کردنی زێدە لە پێویست ف ١) رفتن گروهی به جایی؛ ٢) ولخرجی کردن.

**سەرتیل:** پەتێ کە دە سنگی چادر خراوە ف ریسمان رابط میخ و چادر.

**سەرتیلك:** سەرتلیك ف نگا: سەرتلیك.

**سەرج:** پارچەی لە خوری بۆ جلك، جۆرێ فاسونیا ف نوعی فاستونی پشمی.

**سەرجاخ:** ڕستەی توتن کە بە بەنەوە کراوە ف دستهٔ تنباکو.

**سەرجاڕ:** کەوشەنی کێڵگە ف مرز جای کشت و زرع.

**سەرجال:** سەرجاڕ ف مرز محل کشت و زرع.

**سەرجل:** پەلاسێ کە بەسەر کۆپانو جلی بارە بەردا دەدرێ ف سەرپوش پالان.

**سەرجە:** نەخۆشیەکی ئەسپە ف از بیماریهای اسب.

**سەرجـەلە:** ١) هەوەڵ دانە لە ڕێز؛ ٢) پێشەنگی مێگەل ف ١) اوّلی در صف یا ردیف؛ ٢) پیشاهنگ گله.

**سەرجەم:** تێکرا، تێگرایی ف همه باهم.

**سەرجەنجاڵ:** خەریك بە کار کە نایپەرژێتە سەر شتی تر ف سرگرم کار.

**سەرجێ‌یی:** نوستن لەگەڵ ژندا ف همخوابگی.

**سەرچاخ:** گوڵینگو ریشوی سەری ژنان ف منگوله و رشتهٔ سرپوش زنان.

**سەرچاوکە:** چاوەی ئاو، کانی ف سرچشمه.

**سەرچاوگە:** سەرچاوکە ف سرچشمه.

**سەرچاوە:** سەرچاوکە ف سرچشمه.

**سەرچـڵ:** ١) سەرەوەی لکـەدار؛ ٢) بەهـەڵەو لەزو بیرنەکەرەوە ف ١) بالای شاخهٔ درخت؛ ٢) شتابگر در کار بدون تفکّر.

**سەرچمك:** شاکەڵ، گەشترین گیای بەهار ف شادابترین سبزهٔ بهاری.

**سەرچن:** ١) رنینی پەلکی سەرەوە لە توتنو ریحانەو...؛ ٢) سەرتڵ ف ١) چیدن برگهای بالایی؛ ٢) برگزیدهٔ میوه.

**سەرچنـار:** ١) سەیرانگـایەکـە لەشـاری سولـەیمـانی؛ ٢) گوندێکی کوردستـانـە بەعسی وێرانی کرد؛ ٣) گوندێکە لە لای بۆکان ف ١) تفـریحگـاهی است در شهر سلیمانیه؛ ٢) از روستاهای ویران‌شدهٔ کردستان توسط بعثیان؛ ٣) روستایی نزدیك بوکان.

**سەرچنگانە:** لەسەر دەستو پێ ڕۆیشتن ف چهاردست و پا راه رفتن.

**سەرچۆپی:** ڕەمکێشی هەڵپەڕکێ ف پیشاهنگ رقص گروهی.

**سەرچۆك:** ١) کەشکەئەژنۆ؛ ٢) برێتی لە کرنوُش و ئیکلام ف ١) کشکك زانو؛ ٢) کنایه از کُرنش و تملّق.

**سەرچومەت:** بزوُت ف نیمسوز.

**سەرچوُن:** ١) خەلاس بوُن، نەمان، دوایی‌هاتن؛ ٢) بەخەڵەتچوُن؛ ٣) هەڵچون: (شیرەکـە سەرچوُ) ف ١) سرآمدن؛ ٢) اشتباه کردن؛ ٣) سر رفتن شیر و امثال آن از اثر حرارت.

**سەرچە:** چێشکە، چویك، چۆلەکە، پاساری ف گنجشك.

**سەرچەم:** دەمچۆم، بەستێن ف کنارهٔ رودخانه.

**سەرچەماندن:** ١) برێتی لە تەسلیم‌بوُن؛ ٢) داخستنی سەر بۆ حورمەت گرتنی گەورە ف ١) کنایه از تسلیم شدن؛ ٢) سر فرود آوردن برای تعظیم.

**سەرچەمە:** سەرچاوە ف سرچشمه.

**سەرچـــەوت:** ١) حیســـاب ناڕاست، فێڵبـاز؛ ٢) گوێ‌نەبیس ف ١) بدحساب، نادرست؛ ٢) حرف‌نشنو.

**سەرچەوتی:** نافەرمانی ف نافرمانی.

**سەرچیت:** ئێکەم شەوی چوُنەزۆزان ف اوّلین شب کوچ کردن.

**سەرچیچك:** سەرگۆی مەمك ف نُك پستان.

**سەرحەد:** ١) سنوُر، کەوشەن، حدود؛ ٢) ناوە بۆ پیاوان ف ١) مرز؛ ٢) نام مردانه.

**سەرحەساو:** ئاگادار، خەبەردار ف باخبر، آگاه.

**سەرخـان:** ١) باڵـەخانە، ژوُر لە نهۆمی سەرەوە؛ ٢) ناوی گوندێکە لە کوردستان ف ١) بالاخانه؛ ٢) نام دهی است.

**سەرخستن:** ١) بردنەسەرەوە؛ ٢) دەسگیرۆیی کردنو بەئاوات گەیاندن ف ١) بالا بردن؛ ٢) کنایه از به آرزو رسانیدن و کمك به پیروزی کسی.

**سەرخستنەسەر:** تیزپێ کردن، سۆعبەت پێ کردن ف سر به‌سر گذاشتن.

**سەرخلۆل:** دەبەنگ، بێ‌مێشك ف تهی‌مغز.

**سەرخۆ:** ۱) سەربەخۆ؛ ۲) لەسەرخۆ هێدی، ئارام ف ۱) آزاد و مستقل؛ ۲) آرام.
**سەرخوار:** بەرفەرمان ف مطیع.
**سەرخواس:** کەسێ کە هیچی لەسەر نەبەستوە ف سر برهنه.
**سەرخۆبوُن:** خۆی بوُن، ئازادی تەواو ف استقلال، آزاد شدن.
**سەرخـۆچـوُن:** ۱) بوُرانەوە، بێهۆش بوُن؛ ۲) بایی بوُن ف ۱) از حال رفتن، بیهوش شدن؛ ۲) مغرور شدن.
**سەرخۆر:** ۱) دەردو بەڵای خوایی؛ ۲) برێتی لە منالی شومو بی فەڕ ف ۱) بلای آسمانی؛ ۲) کنایه از کودك بدقدم.
**سەرخـۆش:** ۱) لە بادەخـواردنەوە وەکەیف هاتگ، مەس، مەست؛ ۲) وشەی جوابی دەس خۆش ف ۱) مست می؛ ۲) کلمه‌ای در جواب دست خوش.
**سەرخۆشی:** ۱) دڵشادبوُن بە بادەخواردنەوە، مەستی؛ ۲) پرسە ف ۱) مستی؛ ۲) تسلیت گفتن.
**سەرخولانەوە:** گێژبوُن ف گیج شدن.
**سەرخولێ:** گێژی ف گیجی.
**سەرخوُنْك:** بولبول ف بلبل.
**سەرخۆهاتن:** لە کزی و نەخۆشی رزگاربوُن ف سرحال آمدن.
**سەرخەت:** سنوُر، کەوشەن، حدود، سەرحەد ف مرز.
**سەرخەر:** لاسار، لا، گوێ نەبیس ف حرف نشنو، لجباز.
**سەرخەو:** سوُکەڵەخەو ف خواب سبك موقّتی.
**سەرخەوشکاندن:** تۆزێك نوستن ف کمی خوابیدن.
**سەرخەوکردن:** سەرخەوشکاندن ف کمی خوابیدن.
**سەرخێل:** سالاری هۆزی کۆچەر ف ایلخان.
**سەرد:** سارد ف سرد.
**سەردا:** لەبالاوە، لەبڵندەوە ف از بالا.
**سەردائاژۆتن:** بەسەرداdان، هێرش بۆ بردن ف یورش بردن.
**سەرداخستن:** لەشەرمان سەردەبەر خۆنان ف از شرم سر پایین آوردن.
**سەردار:** سالار، رەئیس ف سردار.
**سەردارعێل:** گەورەی هۆز ف ایلخان.
**سەرداری:** ۱) سالاری، رەئیسی؛ ۲) جۆرێ بالاپـۆش؛ ۳) برێشکەی گەنمەشامی ف ۱) ریاست؛ ۲) لباس سرداری؛ ۳) چُس فیل.
**سەرداف:** سارداو ف سرداب.
**سەرداگرتن:** ۱) زۆربۆهێنان؛ ۲) لەپڕو نەکاو گرتن ف ۱) فشار آوردن؛ ۲) ناگهان گرفتن.
**سەردان:** ۱) دیەنی، دیدەنی؛ ۲) برێتی لە خۆ دەپێنـاونـان؛ ۳) گۆلـك مژانـدن و لەگوان پچـڕین بۆ شیردادانی چێڵ؛ ۴) سەرەننـاز ف ۱) دیدنی؛ ۲) کنـایه از سر بـاختن؛ ۳) گذاشتن و بازگرفتن گوساله از پستان به قصد شیرده کردن گاو؛ ۴) لحاف و پتو.
**سەردانان:** خۆبەخت کردن، خۆبەکوشت‌دان ف سر باختن.
**سەڕداندن:** لە کەو دان، بە بێژنگی کون هەڵە دابێژتن ف اَلَك کردن.
**سەردانەواندن:** سەرچەماندن ف سرخم کردن.

**سەرداو:** سەرداف ف سرداب.
**سەرداهاوردن:** ۱) سەربەشانەکردن؛ ۲) سەرباس دامەزراندن ف ۱) شانه زدن موی سر؛ ۲) سرسخن باز کردن.
**سەرداهێنان:** سەربەشانەکردن، سەر داهاوردن ف شانه زدن سر.
**سەردڕ:** ۱) جلکێ کە لەسـەرەوە دەبـەر دەکـرێ بۆ پاراستنی جلکی باشتـری بنـەوە، بەرگر؛ ۲) تەنراو، جۆلایی کراو: (وەکو جۆلایێ کە ڕازی نەبێ بە **سەردڕی خۆی** / مەڵێن فەساحەتی کوردی بە فارسی ناگا // بەلاغەتێکی هەیە هیچ زمانێ نایگاتێ / لە بێ تەعەسسوبی کوردانە بێ‌رەواج و بەها) «حاجی قادر»؛ ۳) بەرگی نوێ و تازەدوُراو ف ۱) لباس بالایی که لباس زیرین را حفظ کند؛ ۲) تنیده، منسوج؛ ۳) لباس نو دوخته.
**سەردڕانە:** دەسخۆشانەو پاداشتی شاگردجلدرو ف انعام شاگرد خیاط.
**سەردروُ:** دروُنێ کە تەقەڵەکان لە دەرەوە بن ف رودوزی، سردوزی.
**سەردڵ:** جۆرێ نەخۆشیە، گرفت ف نوعی بیماری.
**سەردۆس:** گونـدێکی کوردستـانە بەعسی وێرانی کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان ویران کردند.
**سەردۆشەك:** پارچەیێ کە بەسەر دۆشەکی هەڵدەکێشن ف روتشك.
**سەردۆکردن:** ساردکردنەوە ف نگا: ساردکردنەوە.
**سەردوگەرم:** ساردوگەرم ف نگا: ساردوگەرم.
**سەردۆڵ:** جێگەی رژانی ئاوی ئاسیاو لە دۆلاش‌دا ف جای ریزش آب در ناو آسیا.
**سەردولکە:** بەندی بەمردن هەڵگوتن، پەسنی مردو بە دەنگی گۆرانی ف نوحه.
**سەردولکەبێژ:** کەسێ کە بە گۆرانی پەسنی مردوُ دەدا ف نوحه‌خوان.
**سەردۆڵە:** سفرەی چەرمی نانکەر ف سفرهٔ چرمین نانوایی.
**سەردەدوُنـان:** دوای شتـێ کەوتـن بە غار: (تـاژی **سەری دەدوُی** کەروێشك نا) ف تعقیب کردن باشتاب.
**سەردەرابات:** گوندێکە لە کوردستانی موکوریان ف از روستاهای کردستان.
**سەردەراقی:** گوندێکی کوردستانە بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.
**سەردەراقکێ:** گونـدێکی کوردستـانـە بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.
**سەردەرانـە:** ۱) داری سەروُی چوار چێوەی دەرگا؛ ۲) **هەڵچنـدراوی** سەر دەرگا ف ۱) آستانه؛ ۲) بالاییهای در.
**سەردەرچوُن:** ۱) تێگەیشتن، فامین؛ ۲) رزگاربوُن لە بەڵا ف ۱) درك کردن؛ ۲) رستن از بلا.
**سەردەرکردن:** سەردەرچوُن ف نگا: سەردەرچوُن.
**سەردەرهێنان:** ۱) پەیابوُن: (گیا **سەری دەرهێناوە**، سەری لە پەنجەرە **دەرهێنا**)؛ ۲) سەردەرچوُن، تێگەیشتن ف ۱) پیدا شدن؛ ۲) درك کردن.
**سەردەری:** سەردەرانە ف نگا: سەردەرانە.

**سەردەرێنان:** سەردەرهێنان ف نگا: سەردەرهێنان.

**سەردەس:** جلکی جومگەپۆش ف آستین.

**سەردەست:** سەردەس ف آستین.

**سەردەستان:** ژنێ کە خەریکی زانە ف زنی که دارد می‌زاید.

**سەردەستە:** ١) سەرداری کۆمەڵێك؛ ٢) بریتی لە بژاردە ف ١) رئیس گروه؛ ٢) کنایه از برگزیده.

**سەردەستەکی:** بەپێوە: (سەردەستەکی تفەنگی هاویشت) ف ایستاده کاری کردن که معمولاً نشسته یا خوابیده انجام می‌دهند.

**سەردەسێر:** زۆزان ف سردسیری.

**سەردەشت:** شارێکە لە کوردستان ف نام شهری است، سردشت.

**سەردەفتەر:** ١) بژاردە، یەکەم؛ ٢) کەسێ کە لە دەزگای دەوڵەت بەسەر نۆسەران ڕادەگا ف ١) گزیده، یگانه؛ ٢) سردفتر.

**سەردەق:** ١) نەژاکاو؛ ٢) دەس لێ نەدراو ف ١) پژمرده نشده؛ ٢) دست نخورده.

**سەردەق شکاندن:** بەر لە خەڵك دەست بەکارێ کردن ف پیش از دیگران به کاری دست زدن.

**سەردەم:** کات، وەخت ف اوان، هنگام.

**سەردەمە:** دەمپۆشی ساوا لە بێشکە دا ف دهن‌پوش نوزاد در گهواره.

**سەردەمێ:** لەڕۆژگارێکا ف یك وقتی.

**سەردەمی:** کاتی، وەختی، نەهەمیشەیی ف موقّتی.

**سردەمێك:** سەردەمێ ف یك‌وقتی.

**سەردەن:** دەرخۆنەی کۆپە ف نهنبان خم.

**سەردەنشت:** سەرزەنشت، لۆمە ف سرزنش.

**سەردەوبۆن:** ساردبۆنەوە ف نگا: ساردبۆنەوە.

**سەردەوکردن:** ساردکردنەوە ف نگا: ساردکردنەوە.

**سەردی:** ساردی ف نگا: ساردی.

**سەر دیلان:** سەرچۆپی ف شخص پیشرو در رقص کردی.

**سەردینان:** گوندێکی کوردستانە بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**سەرڕا:** ١) ژنوێ؛ ٢) لەژۆوڕا؛ ٣) بەوحاڵەش، دەگەڵ ئەمەشا؛ ٤) سەرڕێگە ف ١) از نو؛ ٢) از بالا؛ ٣) علاوه بر این، با اینهمه؛ ٤) سر راه.

**سەرڕاست:** ١) راستەوڕاست؛ ٢) دەسپاك، بێ خواری و لاری، ئەمین؛ ٣) کارامەو لێزان ف ١) مستقیم؛ ٢) امین؛ ٣) ماهر.

**سەرڕاستی:** ئەمینی، بێ گزی و دزی ف درستکاری.

**سەڕاف:** سەڕاف ف صرّاف.

**سەررشتە:** ١) سەرتا، سەرتاڵ؛ ٢) لەکار زانین ف ١) سرنخ؛ ٢) مهارت در کاری.

**سەرڕۆت:** ١) کەسێ هیچی لەسەر نەبەستبێ؛ ٢) بریتی لە منداڵی خوێندەواری شار ف ١) سر برهنه؛ ٢) کنایه از بچه مدرسه‌ای.

**سەرڕوشتە:** سەررشتە ف نگا: سەررشتە.

**سەرڕەش:** ١) بریتی لە ژن؛ ٢) مەلێکی پچوکە سەری ڕەشە؛ ٣) کەسێ نوخشانەی خراپ ئەدا ف ١) کنایه از زن؛ ٢) پرنده‌ای است؛ ٣) کسی که نفوس بد می‌زند.

**سەرڕەشە:** سەرڕەش ف نگا: سەرڕەش.

**سەرڕەو:** پڕتاو، لنگدانی توند ف پرتاب، دو سریع.

**سەرڕەق:** سەرسەخت ف سرسخت.

**سەرڕێداچو:** لەڕێ لادەر، ڕێ‌گوم‌کردو ف گمراه.

**سەرڕێژ:** دەفری زۆر پڕ کە جێگەی تری لێ نابێتەوە ف لبریز.

**سەرڕێژکردن:** لێ‌ڕژان لەبەر پڕی دەفر ف لبریز کردن.

**سەرزارەکی:** قسەی بەدەم نە بەکردەوە ف سخن بدون عمل.

**سەرزاری:** سەرزارەکی ف سخن بدون عمل.

**سەرزڤران:** ١) گێژبون؛ ٢) سەرسوڕمان ف ١) سرگیجه؛ ٢) متحیّر شدن.

**سەرزڤراندن:** سەربادان ف کنایه از اظهار ناخشنودی کردن.

**سەرزڤرین:** سەرزڤران ف نگا: سەرزڤران.

**سەرزڤرێن:** شتی عەجایب، سەمەرە، مایەی سەرسوڕمان ف مایهٔ تعجب.

**سەرزگە:** لەرزینی زۆر بەتەوژم لەترسان ف لرزهٔ شدید از ترس.

**سەرزل:** ١) سەرزەلام، کەسێ سەری گەورە بێ؛ ٢) وشەیەکە بە گاڵتە یان بۆ سەرزەنشت دەیڵێن ف ١) سرگنده؛ ٢) کلمه‌ای است که به شوخی یا عتاب گویند.

**سەرزەدە:** ١) بێ پرس‌وڕا؛ ٢) پاژی بچوك لە خشت ف ١) سرزده؛ ٢) قطعه‌ای از خشت.

**سەرزەنش:** سەردەنشت ف سرزنش.

**سەرزەنشت:** سەردەنشت ف سرزنش.

**سەرزەیە:** ١) سەربزێو؛ ٢) سەربزێوی ف ١) گردنکش؛ ٢) گردنکشی.

**سەرزیکرن:** سەردەرێنانی ڕوەك یان زیپکە ف بردمیدن گیاه یا جوش.

**سەرزین:** زین‌پۆش ف سرزین.

**سەرزیوارە:** سەرئێوارە ف عصر هنگام.

**سەرژان:** یەکەم‌ژانی بێچوبۆن ف آغاز درد زایمان.

**سەرژمار:** ١) مرۆ یان ئاژەڵ ژماردن؛ ٢) کەسێ کە گیانداران دەژمێرێ ف ١) آمار؛ ٢) آمارگیر.

**سەرژماری:** بژاردنی مرۆ یان ئاژەڵ ف سرشماری.

**سەرژمێر:** سەرژمار ف نگا: سەرژمار.

**سەرژمێری:** سەرژماری ف سرشماری.

**سەرژنانە:** پیاوێ کە کرداری ژنانە دەکا ف مرد زن‌نما.

**سەرژنانیلە:** سەرژنانە، ژنانیلە ف مرد زن‌نما.

**سەرژنك:** پیاوێ کە لە ماڵە خوێ‌دا چرۆك و رژدە، ئەنگوتك بژێر ف مردی که در خانوادهٔ خود خسیس است.

**سەرژنکانی:** سەرژنك ف نگا: سەرژنك.

**سەرساخی:** سلامەتی، ساغی ف سلامت.

**سەرساغی:** سەرساخی ف سلامت.

**سەرساڵ:** جەژنی سەرەتای خاکەلێوە، نەورۆز ف نوروز.

**سەرسام:** داماو، سەرسوڕماو، واق وڕبوگ ف مات و متحیر.

**سەرسامە:** نیشانەی عەجایب‌مان لە نوُسیندا: (!) [ف] علامت تعجب.

سەرسبە: بەری بەیانی [ف] کلّهٔ سحر.

**سەرسپاردن:** هاتنە بەرفەرمان [ف] سرسپردن.

**سەرسپی:** ژنی پیری بەرێزو تەگبیرکەر لە ئاوایی‌دا [ف] گیسوسفید کدخدامنش.

**سەرسڤك:** ١) کەم ئەرك: ٢) ئاسوُدە [ف] ١) کم کار: ٢) آسودە.

**سەرسڤکی:** ١) کەم‌ئەرکی: ٢) ئاسوُدەیی [ف] ١) کم‌کاری: ٢) آسودگی.

**سەرسکڵی:** سەرپەل، نانێ کە لەسەر پەنگر ببرژێ [ف] نانی کە بر اخگر پزند.

**سەرسم:** ڕەتی یەکسم [ف] سکندری خوردن ویژهٔ ستور.

**سەرسم بردن:** رەت دانی یەکسم [ف] سکندری خوردن چهارپا.

**سەرسم دان:** سەرسم بردن [ف] سکندری خوردن چارپا.

**سەرسم کرن:** سم تراشین [ف] سُم تراشیدن.

**سەرسنـگ:** شاروکێکی زۆر هەواخـۆش و هاوینەواربوُ بەعسی وێرانی کرد [ف] شهرکی تابستانی و باصفا کە بعثیان ویران کردند.

**سەرسواڵکەر:** خوازەلۆك، خازۆك [ف] گدامنش.

**سەرسوت:** بزوُت [ف] نیمسوز.

سەرسوٚر: بێ‌دایك‌و بێ‌سەرپەرست [ف] یتیم بی‌سرپرست.

**سەرسوڕ:** سەرسام [ف] مات و متحیر.

**سەرسـوُر:** ١) وەشـارتـو. نهێنی. وشەیەکە لە جۆرێ گەمەی شەوانەدا دەیڵێن: (سـەرسـوُری من لەکوێ‌یە واتا: مەبەستم یان وەشاردوەکەم چیەو لەکـوێ‌یە)؛ ٢) برێتی لە تەڕکی پیاو، کێر [ف] ١) پوشیده، نهان شده؛ ٢) کنایه از آلت مرد.

**سەرسوڕمان:** دامان، سەیرمان [ف] متحیّر شدن.

**سەرسوُری:** گوندێکی کوردستانە بەعسی وێرانی کرد [ف] از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**سەرسوُری بن دڕاو:** لە دور جوانی لە نزیك ناحەز [ف] زیبانمای زشت.

**سەرسوُری بن‌دڕیای:** سەرسوُری بن دڕاو [ف] زیبانمای زشت.

**سەرسوُری بن‌شڕ:** سەرسوُری بن دڕاو [ف] زیبانمای زشت.

**سەرسوڕێن:** سەرزڤڕێن [ف] مایهٔ تحیّر.

**سەرسوُك:** سەرسڤك [ف] نگا: سەرسڤك.

**سەرسوُکبوُن:** خەلاس بوُن لە کار [ف] فراغت از کار.

**سەرسوُکی:** سەرسڤکی [ف] نگا: سەرسڤکی.

**سەرسەخت:** سەرڕەق [ف] سرسخت.

**سەڕسەڕ:** بای ساردی بەتەوژم [ف] باد صرصر.

**سەڕسەڕخانە:** برێتی لە خانوی زۆر سارد [ف] کنایه از خانه بسیار سرد.

**سەرسەری:** ١) چەورە، خوێڕی‌و بێکارە؛ ٢) سەرچڵ، بێ‌بیر کردنەوە؛ ٣) هەردەم لەسەر خەیاڵێك، وازوازی [ف] ١) ولگرد هرزە؛ ٢) سطحی، بدون تأمل کردن؛ ٣) هردم بر فکری، دم‌دمی مزاج.

**سەرسەکە:** کوُزی باریکەڵە لە خەیارو گندورەو هەنی‌و... [ف] قاچ نازك از خیار و هندوانە و...

**سەرسـەنـگ:** ١) پارسـەنـگ، سڵاودانەوەی تەرازو؛ ٢) لاسار، گوێ نەبیس؛ ٣) گوندێکی کوردستانە بەعسی وێرانی کرد [ف] ١) خاطرانه کمی گران کشیدن ترازو؛ ٢) خشك سر؛ ٣) از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**سەرسەوز:** نێرەمراوی [ف] مرغابی نر.

**سەرسینگ:** نێوان هەردومەمکان [ف] بین دو پستان زن.

**سەرشـار:** ١) سەری مەیدانی گەمـە؛ ٢) ئاخری مەیدانی گەمە [ف] ١) آغاز زمین‌بازی؛ ٢) پایان زمین‌بازی.

**سەرشان:** ١) ملەی کێو؛ ٢) تیشوُی ڕێ؛ ٣) تیشوُدان؛ ٤) بەشێ لە جل کە شانی مروٚ دەگرێ [ف] ١) ستیغ؛ ٢) توشە؛ ٣) توشەدان؛ ٤) سرشانهٔ لباس.

**سەرشانە:** سەرۆك، بەرانبەری بنۆك [ف] بخش مرغوب پشم شانە کردە.

**سەرشڤ:** سەرتڵ، بزاردە [ف] گزیدە.

**سەرشکەستی:** خەجاڵەت [ف] شرمندە.

**سەرشکێن:** بەسەرچڵی کارکردن [ف] سرسری انجام دادن کار.

**سەرشکێنـە:** پاشمـاوەی بەش دابەش کردنەوە [ف] باقیماندهٔ تقسیم را قسمت کردن.

**سەرشوٚ:** جێگەی خوٚشتن لەماڵدا، شوٚرکە [ف] جای آب‌تنی در خانه.

**سەرشوٚر:** دەلاکی گەرماو [ف] دلّاك حمّام.

**سەرشوٚڕ:** خەجاڵەت [ف] شرمسار.

**سەرشوٚڕکردن:** سەرداخستن لەشەرمان [ف] سر بەزیر افکندن از خجالت.

**سەرشوٚرکە:** سەرشوٚ [ف] نگا: سەرشوٚ.

**سەرشوٚڕی:** شەرمەزاری، حەیاچوُن [ف] شرمساری.

**سەرشـوٚك:** ١) باڵـداریکە چکۆڵە؛ ٢) حەمام، جێگەی خوٚشتن [ف] ١) گنجشك‌سانی است؛ ٢) گرمابە.

**سەرشـە:** سەرشانە، سەرۆکی خوری‌و مو کە بەسەر شانەوە دەمێنێ [ف] تکە پشم یا مویی کە بر شانە می‌ماند.

**سەرشەق:** ١) پێش‌دەستی لەکاردا؛ ٢) سەرسەخت [ف] ١) پیشدستی در کار؛ ٢) سرسخت.

**سەرشەھ :** سەرشە [ف] نگا: سەرشە.

**سەرشێت:** ١) بزۆزو دانـەسەکناو؛ ٢) حوٚل و گێل؛ ٣) وڕو گێژ [ف] ١) ناآرام؛ ٢) خُل، نیم‌دیوانە؛ ٣) گیج.

**سەرشیر:** توێ‌شیر، سەرتوێ، سەرتو [ف] چرابە، سرشیر.

**سەرشیفوٚك:** باڵداریکە [ف] پرندەایست.

**سەرشین:** برێتی لە ژنی پێ‌ڕەش‌و شوُم [ف] کنایه از زن نحس و بدقدم.

**سەزشینـك:** مەلێکی بچـوُکـە بەقـەد چوٚلەکە دەبێ‌و سەری شینە [ف] پرندەای کوچك اندازهٔ گنجشك.

**سەرشینکە:** پوٚپەرەشە، نەخوٚشی مریشکانە [ف] وبای مرغی.

**سەرشیو:** ناوی مەڵبەندێکە لە کوردستان [ف] نام ناحیەای در کردستان.

**سەرشێو:** ١) کاتی نانی بەیانی؛ ٢) کاتی ڕوٚژوکـردنـەوە [ف] ١) هنگـام چاشت؛ ٢) هنگام افطار.

**سەرشێوان:** دامان، سەرسام‌بوُن ف شوریدگی، گیجی، سراسیمگی.
**سەرعێل:** سەرخێڵ ف ایلخان.
**سەرف:** خەرج، مەزیخ، بەخت ف خرج.
**سەرفترە:** باجی ئاینی لە گەنم یان دانەوێڵە بەرانبەر بە هەر موسوڵمانێ ف زکات فطر، فطریه.
**سەرفراز:** سەربڵند ف سرفراز.
**سەرڤە:** لای سەرو ف طرف بالا.
**سەرقاپ:** سەرپۆشی دەفر ف سرپوش ظرف، در ظرف.
**سەرقاپ‌نانەوە:** داپۆشینی دەفر ف سرپوش گذاشتن بر ظرف.
**سەرقاڵ:** زۆر خەریکی کار ف بسیار مشغول.
**سەرقژن:** ۱) کەسێ کە مۆی سەری ئاڵۆزو تێکەڵ پێکەڵە؛ ۲) بریتی لە جنۆکە ف ۱) ژولیده موی؛ ۲) کنایه از جنّ.
**سەرقژیلکە:** سەرقژن ف نگا: سەرقژن.
**سەرقفلانە:** پارەدان بۆ چۆڵ کردنی دوکان و خانوی ئیجارە ف سرقفلی.
**سەرقفلی:** سەرقفلانە ف سرقفلی.
**سەرقوپ:** دوند، ترۆپك ف بالاترین نقطه، قلّه.
**سەرقوت:** کوتانی گەنم نە بەتەواوی ف نیم کوبی گندم بلغور.
**سەرقۆت:** سەررۆت، سەرخواس ف سر برهنه.
**سەرقوتان:** چوُنەدیاری شت ف دیدار، وارسی.
**سەرقوتی:** سەرخواس ف سر برهنه.
**سەرقوتین:** سەرقوت ف سر برهنه.
**سەرقوش:** قەیاسە، هەیاسەی چەرم ف نگا: قەیاسە.
**سەرقول:** جگی ناو دوپەنجەی مناڵ کە لە جگێن‌دا بە پیرۆزی دەزانێ: (**سەرقول** دەرهات، دەجگان رۆهات) ف شتالنگی که در بازی برای یمن نگه می‌دارند.
**سەرقوڵ:** ۱) سەردەستەی داروغە؛ ۲) سەردەس، جلکی جومگەپۆش ف ۱) سرنگهبان؛ ۲) سرآستین.
**سەرقولە:** جۆرێ ترێ ف نوعی انگور.
**سەرقوڵە:** سەرقوڵ ف نگا: سەرقوڵ.
**سەرقەبران:** قەبرستان ف گورستان.
**سەرقەبڵاندن:** سەرفترەدان ف دادن زکات فطر.
**سەرقەپاغ:** سەرپۆشی دەفرو سنوق ف پوشش ظروف.
**سەرقەتار:** ۱) پێشەنگی کاروان؛ ۲) رەئیسی کاروان ف ۱) پیشاهنگ کاروان؛ ۲) قافله‌سالار.
**سەرقەڵ:** ترۆپك، دوند ف قلّه، قلّهٔ کوه.
**سەرقەڵانگ:** خەڵەی تینوی سەرلەتینوان چەماو ف ساقهٔ از بی‌آبی خم شده.
**سەرقەڵەم:** گەورە نوُسەری میری ف منشی‌باشی.
**سەرقەڵەمانە:** هەقدەستی نوشتەنوُس ف مزد دعانویس.
**سەرقەوی:** سەرزل ف سرگُنده.
**سەرك:** سەر قەپاخ، سەرپۆشی دەفرۆکە ف سرپوش ظرف کوچك.
**سهرك:** ۱) زڕ، سهر، بەدەڵ؛ ۲) قوتکەی سەر لوُلەی تفەنگ ف ۱) بدل؛ ۲) مگسهٔ تفنگ.
**سەرکاب:** ئاواڵ کراس، دەرپێی ژنان ف دامن.
**سەرکار:** کاربەدەستی ئاغا، کەسێ لە لایەن ئاغاوە بە خەڵەو خەرمان رادەگا ف نمایندهٔ ارباب برای رسیدگی به امور غلّه.
**سەرکارانە:** باجێ کە رایەت دەیدا بە سەرکار ف مزدی که رعیّت به مباشر ارباب می‌دهد.
**سەرکان:** هوزێك کە زۆرتیرەی لێ جیابوُنەوە ف عشیره‌ای که تیره‌های مختلف از آن جدا شده است.
**سەرکانی ئێلی:** سەرەك هۆز، سەرکۆمار ف پیشوا.
**سەرکاوان:** سەڵان، سەران ف کوهساران.
**سەرکردن:** ۱) تەخمین، بەراوردکردن؛ ۲) پێ‌راگەیشتن؛ ۳) لەئامانج بڵندتر لێدانی تیر و گوللە؛ ۴) لاتەرازو لە لاکەی تر گرانتر بوُن: (کەس نەڵێ مەحبوُ بە خێڵ و قیچە مەیلی شەڕ دەکا / خێڵ و قیچە یان تەرازوی نازی نەختێ **سەر دەکا**) «نالی» ف ۱) برآورد؛ ۲) رسیدگی؛ ۳) از هدف بالاتر رفتن تیر؛ ۴) سنگینی یك کفهٔ ترازو.
**سەرکردن بەگوما:** سەربەگوماکردن ف کنایه از از میان بردن.
**سەرکردنەسەر:** سەرخستنەسەر ف سر بەسر گذاشتن.
**سەرکردنەوە:** ۱) ترس لە دەستدانە کارێك؛ ۲) جوش دانەوەی سەری ئامرازی کول‌بوی کانزا: (گاسنەکەم **سەرکردەوە**) ف ۱) واهمه از انجام دادن کاری؛ ۲) تکه جوش دادن بر سر ابزار فلزی کند شده.
**سەرکردە:** فەرماندەی لەشکر ف فرماندهٔ سپاه.
**سەرکرن:** دەمەزەر کردنەوەی گاسن ف مرمّت لبه‌های گاوآهن.
**سەرکزنیك:** ۱) جندۆکە؛ ۲) بەدفەڕ، شوُم، جوت‌قوشە ف ۱) جنّ؛ ۲) نحس.
**سەرکرێ:** مزەی پتر لە مزی رۆژانە یا مانگانە ف اضافه حقوق.
**سەرکز:** ۱) خەمگین؛ ۲) لارەمل ف ۱) غمگین؛ ۲) سرافکنده از غم.
**سەرکزوڵە:** پوُتەکە ف لاغر بی‌نمود.
**سەرکزی:** لارەملی و خەمباری: (چوُبوُمە بەزمی خاسی برازا عەزیزەکەم / دوێشەو بە سەد تەوازوع و ئیخلاس و **سەرکزی**) «شێخ رەزا» ف گردن‌کجی و غمگینی.
**سەرکل:** ۱) چفتی دەرگا داخستن لە ژوُرەوە؛ ۲) تەرسەقول، قارسەقول ف ۱) چفت در؛ ۲) مدفوع الاغ.
**سەرکڵ:** سەرئاورگە: (**سەرکڵی** جەهەندەم) ف بالای آتشدان اجاق.
**سەرکڵاو:** ۱) ماشێنەی جێ پڵیتەی لامپا؛ ۲) کڵاوی خوری بۆ دەمی بەفرو باران ف ۱) جای فتیله در چراغ نفتی؛ ۲) کلاه پشمی بارانی.
**سەرکڵاوە:** سەرکڵاو ف نگا: سەرکڵاو.
**سەرکڵوم:** سەرکل ف چفت در.
**سەرکلە:** سەرکل ف چفت در.
**سەرکو:** ۱) گەنمی سەرەوەی خەرمان؛ ۲) سەردەنشت ف ۱) گندم بالایی تودهٔ خرمن؛ ۲) سرزنش.
**سەرکوپ:** کڕنوش، داهاتنەوە بۆ ڕێزلێنان ف تعظیم.
**سەرکۆت:** سەربێژنگ لە کاتی دەغل گێژەوکردندا ف قشر بالایی در

غربال کردن غلّه.

**سەرکوتیلك:** گیایەکە بۆ لەوەڕ ف علفی است.

**سەرکورکردن:** سەرتاشین، پرچ بڕین ف سر تراشیدن.

**سەرکۆزر:** گوڵەخەڵەی بەرگێرە نەکەوتوێ درشت ف کوزر درشت مانده.

**سەرکوزوڵە:** سەرقژن ف ژولیده سر.

**سەرکۆزەر:** سەرکۆزر ف کوزر درشت مانده.

**سەرکول:** قەرسەقول، ڕیاوی کەر ف مدفوع الاغ.

سەرکول: بەرکوڵ ف نگا: بەرکوڵ.

**سەرکوڵ:** ١) سەرقوت؛ ٢) پاچەکوڵە؛ ٣) داری نێوان ئەستوونو بان ف ١) سر برهنه؛ ٢) نوعی کلنگ لبه کند؛ ٣) سرستون.

**سەرکوما:** گەنمی سەرەوەی خەرمان، سەرکۆ ف گندم بالایی توده خرمن.

**سەرکومار:** ١) کار بەدەستو دەسەڵات داری چەند هۆزو عەشیرەت؛ ٢) رەئیس جمهور. *گەورەی وڵاتێ کە بۆ ماوەی چەند ساڵ لە لایەن خەڵکەوە هەڵدەبژێردرێ* ف ١) سردار چندین تیره و طایفه از مردم؛ ٢) رئیس‌جمهور.

**سەرکونە:** سەرزەنشت، سەرکۆ ف سرزنش.

**سەرکوێر:** دەبەنگ، تێ نەگەیشتو، نازیرەك ف کودن.

**سەرکوێزر:** سەرکۆزر ف نگا: سەرکۆزر.

**سەرکەتن:** ١) بەرەژوورچوون؛ ٢) بەکام گەیشتن لە دۆزو مەبەستا ف ١) بالا رفتن؛ ٢) کامیاب شدن.

**سەرکەش:** سەربزێو ف سرکش.

**سەرکەشی:** ١) سەر بزێوی؛ ٢) پێ ڕاگەیشتن ف ١) تمرّد؛ ٢) رسیدگی.

**سەرکەف:** ١) تاویاوەی سەرکەوتوی پیو لە سابون چێکردندا؛ ٢) خوێی هەرە سپی و جوان لە خوێڵێن ف ١) گداختهٔ پیه بالا آمده در کار صابون‌سازی؛ ٢) نمك صاف طبقهٔ بالا در نمکزار.

سەرکەفتن: سەرکەتن ف نگا: سەرکەتن.

**سەرکەل:** سەری چیا ف بالای کوه.

**سەرکەڵ:** دەستەکی چیغ قایم‌کردن ف چوبی که چیغ را نگه می‌دارد.

**سەرکەللە:** ١) بەشی سەرەوەی رەشمە کە بە دەوری سەرو ژێر چەنەی یەکسمدا دێت؛ ٢) پارچەیەك لە رەشماڵ کە کورتایی تەواو کا ف ١) جای بنـدافسـار که پیرامون کلّهٔ ستور گیرد؛ ٢) تکه‌ای از چادر که کوتاهی را جبران کند.

**سەرکەلە:** سەرکەللە ف نگا: سەرکەللە.

**سەرکەند:** گوندێکی کوردستانە بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**سەرکەنە:** گوریسی دابەستنی سەر عەڕەبانە بۆ کلۆش کێشان ف ریسمانی که در ساقه‌کشی به‌کار آید.

**سەرکەوتن:** سەرکەتن ف نگا: سەرکەتن.

**سەرکەوتو:** بەکام گەیشتو، تورەقی کردو ف به‌کام رسیده، ترقّی کرده.

**سەرکەوتە:** سەرکەوتو ف نگا: سەرکەوتو.

**سەرکێش:** سەرکەش ف نافرمان، سرکش.

**سەرکێشان:** ١) سەرەتاتکێ کردن، روانین بەدزیەوە؛ ٢) کارگەیشتنە بارێکی دیاری؛ ٣) هەوساری بارەبەرگرتن لە ڕێگادا ف ١) فضولانه و دزدکی نگاه کردن؛ ٢) به‌حدّی رسیدن کار؛ ٣) افسار ستور کشیدن در راه.

**سەرکێشك:** رەئیسی ئێشك گران ف سرکشیك.

**سەرکێشی:** سەرکەشی، سەربزێوی ف سرکشی، نافرمانی.

**سەرکێف:** سەرچیا ف بالای کوه.

**سەرگ:** لای ژوورو ف طرف بالا.

**سەرگاویك:** گیایەکە دەخورێ ف گیاهی خوردنی.

سەرگر: ١) کەسێ حەیوانی مێوینە بۆ جوت بون دەگەڵ نێر دەگرێ؛ ٢) برێتـی لە گەواد ف ١) کسـی که حیوان ماده را برای جفـتـگـیری می‌گیرد؛ ٢) کنایه از جاکش.

**سەرگران:** ١) تەمـەڵ، تەوەزەل؛ ٢) سەرخـۆش؛ ٣) برێتی لە ئەسپی ڕانەهێنراو ف ١) تنبل؛ ٢) مست؛ ٣) کنایه از اسب تعلیم ندیده، رام نشده.

**سەرگرتن:** ١) پێك هاتنی کار؛ ٢) تەواوکردنی خانو؛ ٣) گرتنی مێوینە بۆ گانی نێر؛ ٤) برێتی لە گەوادی ف ١) انجام شدن؛ ٢) تمام کردن بنا؛ ٣) گرفتن حیوان ماده برای جفتگیری؛ ٤) کنایه از جاکشی.

**سەرگرتنەوە:** پەیداکردنەوەی گومبوگو دزراو ف دوباره یافتن.

**سەرگرتە:** خلیسکاو ف لیز خورده.

**سەرگندان:** داماو، پەشێو ف سرگردان.

**سەرگـو:** ١) سەرانـوێلك؛ ٢) تەپـاڵـدان؛ ٣) سەری جێگـای خڕ: (سەرگۆی مەمك) ف ١) سرگینگاه؛ ٢) تپاله‌دان؛ ٣) انتهای گردی.

**سەرگورز:** سەرزل ف سرگنده.

**سەرگورزی:** ١) سەرسەختی؛ ٢) تۆڕەیی، تۆسنی ف ١) لجاجت؛ ٢) تندخویی.

سەرگورشتە: چیرۆکی رابوردە ف سرگذشت.

**سەرگوروشتە:** سەرگورشتە ف سرگذشت.

**سەرگۆری:** قوربان، فیدایی ف فدایی.

**سەرگوزەشتە:** سەرگورشتە ف سرگذشت.

**سەرگوشاد:** سەرناواڵە، بێ سەرپوش ف سرگشاده.

**سەرگوڵ:** ١) هەوڵچا لە چادان؛ ٢) چاکترین، هەڵبژاردە ف ١) اولین چای از قوری؛ ٢) بهترین، برگزیده.

**سەرگوم:** بێ سەروشوێن ف گم بی‌اثر.

**سەرگۆم:** گیسکی ڕیوەڵە ف بزغالهٔ لاغر بدنمود.

**سەرگوم کردن:** شێوان، پەشێو بون ف خبط، پریشانی.

**سەرگوێلك** سەرانگوێلك ف شوله، سرگینگاه.

**سەرگەڕ:** سیسارگ ف کرکس.

**سەرگەرد:** ١) بەلاگەردان؛ ٢) قوربان ف ١) بلاگردان؛ ٢) قربان.

**سەرگەردان:** پەشێو، داماو ف سرگردان.

**سەرگـەرم:** ١) خەریکی کار؛ ٢) تۆڕەو تۆسن؛ ٣) سەرخـۆش ف ١)

مشغول کار؛ ۲) تندخوی؛ ۳) مست.

**سەرگەشتە:** نارازی، بێ‌مەیل ف ناخشنود.

**سەرگەڤار:** رەئیسی خێزانی ماڵ ف رئیس خانواده.

**سەرگەڤاز:** سەرگەڤار ف رئیس خانواده.

**سەرگەلا:** سەربەنك ف نگا: سەربەنك.

**سەرگەلە:** رەمکێش، پێشەنگی مێگەلەمەڕ ف نخراز، پیشاهنگ گله.

**سەرگەورە:** ۱) سەرگەڤار؛ ۲) سەردەستە ف ۱) رئیس خانواده؛ ۲) سردسته.

**سەرگێجە:** سەرگێژی ف سرگیجه.

**سەرگێڕ:** حەوشێکی لە تامـان بۆ ماڵات تێ کردن ف حصـار برای نگهداری دام.

**سەرگێرە:** گای پێشەوە لە گێرەدا ف گاو سردسته در خرمن کوبی.

**سەرگیز:** ناوی گوندێکە ف نام روستایی است.

**سەرگین:** ۱) ئەوی لە باڵا، بڵندتر؛ ۲) سنێر، شیاکە، ریخ ف ۱) بالایی؛ ۲) سرگین.

**سەرلق:** ۱) لکەداری سەرەوە؛ ۲) فەرماندەی سەد پێشمەرگە؛ ۳) جۆرێ هەنار ف ۱) شاخهٔ بالایی؛ ۲) فرماندهٔ صد مرد مسلّح؛ ۳) نوعی انار.

**سەرلك:** لکی سەروی دار ف شاخهٔ بالایی.

**سەرلـە:** هەر لە دەست پێکـرانـەوە: (سـەرلە بەیانی، سەرلە نگۆرێ، سەرلە هەوەڵەوە) ف شروع هنگام.

**سەرلەپ:** چەپۆکانی ئەسپ ف سرپا ایستادن اسب.

**سەرلەپك:** پەتی زاربێنی خێگە ف بند دهانه‌بند خیگ.

**سەرلەشکر:** سەرکردە، فەرماندەی لەشکر ف فرماندهٔ سپاه.

**سەرلەنوێ:** ژنو ف از نو.

**سەرلێ بادان:** سەرژقراندن ف اظهار ناخشنودی کردن.

**سەرلێ تێکچوُن:** پەرێشان بوُن، دامان ف راه چاره گم کردن.

**سەرلێ تێکدان:** وە سەر هەڵەخستن ف به‌اشتباه انداختن.

**سەرلێ خوران:** نارەزوُکردنی کارێك ف هوس کردن.

**سەرلێ دان:** دیەنی کردن ف دیدنی کردن، سرزدن.

**سەرلێدانەوە:** چوُنەوە دیدەنی کەسێك ف بازدید کردن.

**سەرلێ دەرچوُن:** تێ گەیشتن ف فهمیدن.

**سەرلێ دەرکردن:** سەرلێ دەرچوُن ف فهمیدن.

**سەرلێ سەندن:** سەرلێ تێکدان ف به اشتباه انداختن.

**سەرلێ شێوان:** پەشێو بوُن ف پریشان و سرگردان شدن.

**سەرلێ شێواندن:** سەرلێ تێکدان ف به اشتباه انداختن.

**سەرلێ کردن:** ترس لە دەست بەکارێ کردن ف واهمه از انجام دادن.

**سەرما:** دژی گەرما، ئەو دەمانە کە مرۆ بە جلك و ئاگر ئاتاجە ف سرما.

**سەرمابردگ:** شتێ یان کەسێ کە سەرما زیانی پێ گەیاندوە ف سرمازده.

**سەرمابردن:** سەرما کارلێ کردن ف سرمازدگی.

**سەرمابردو:** ۱) سەرمابردگ؛ ۲) برێتی لە کەسێ کە بە سەرمایە قەڵسە ف ۱) سرمازده؛ ۲) کنایه از کسی که تاب مقاومت سرما ندارد.

**سەرمابردە:** سەرمابردو ف نگا: سەرمابردو.

**سەرمابردەڵ:** سەرمابردو ف نگا: سەرمابردو.

**سەرمابردەڵە:** کەسێ کە ناتوانێ خۆی لەبەر سەرما راگرێ ف کسی که مقاومت سرما ندارد.

**سەرمـابـوُن:** ۱) نەخۆش کەوتن لەسەرمان؛ ۲) لەش هەست بەسەرما کردن ف ۱) سرماخوردگی؛ ۲) احساس سرما کردن.

**سەرمازەڵە:** خەمەگزو، جۆرێ مارمێلکە ف چلپاسه.

**سەرماوسوڵ:** دەمی زۆر ساردو سەرما، سەرماو بەستەڵەك ف سرما و یخبندان.

**سەرماوسوڵە:** سەرماوسوڵ ف سرما و یخبندان.

**سەرماوەز:** نۆهەمین مانگی ساڵ ف آذرماه.

**سەرمایە:** دەسمایە ف سرمایه.

**سەرمایەدار:** دەوڵەمەند ف سرمایه‌دار.

**سەرمایی:** سەرساخی ف سلامت.

**سەرمژانە:** دارێکی کورتە لەنێوان نیرو ئامورداف چوبکی رابط خیش و یوغ.

**سەرمك:** سەرجەم ف همه باهم.

**سەرملە:** زینوُ، ملەی کێو ف گردنهٔ کوه.

**سەرملەگیر:** ریگر، چەتە ف راهزن.

**سەرمەلا:** رەئیسی گاڵتەو گەمە ف اداره کنندهٔ بازی.

**سەرمۆر:** سەربەمۆر ف دست نخورده، سر بەمُهر.

**سەرمەرزە:** گوندێکی کوردستانە بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**سەرمەزد:** سەردەستەی گەمەکەران ف رئیس تیم بازیکنان.

**سەرمەزن:** ۱) سەرزل؛ ۲) سەرگەورەی هۆز ف ۱) سر گُنده؛ ۲) رئیس ایل.

**سەرمەس:** سەرخۆش ف سرمست.

**سەرمەست:** سەرمەس ف سرمست.

**سەرمەستی:** سەرخۆشی ف سرمستی.

**سەرمەشق:** نموُنە بۆ فێرکردن ف الگو، سرمشق.

**سەرمەشقانە:** شەرمەشکانە. *دیاریەکە زاوا دەیدا بە بوُك کە تارا لەسەر روی لابەرێ* ف رونمای عروس.

**سەرمەشقانێ:** سەرمەشقانە ف رونمای عروس.

**سەرمەشکانە:** سەرمەشقانە ف رونمای عروس.

**سەرمەقولات:** بەسەرسەردا خۆتاوەژۆ کردنەوە ف پشتك.

**سەرمیان:** سەرمایە، دەسمایە ف سرمایه.

**سەرمێکوتە:** ۱) جانەوەرێکی بچوُکی سەر خڕە لە زەلکاودا دەژی؛ ۲) کەچکەقوڵەی بۆق ف ۱) حشره‌ایست مردابزی؛ ۲) تخم قورباغه.

**سەرمێوژە:** جۆرێ ماری بۆرەلوُکەی باریکە ف نوعی مار.

**سەرنـاز:** بەسـەرددراو، بەخـۆ دادەر، هەرپـارچـەیە کە بەسـەر شت هەڵدەکشێ ف سرانداز.

**سەرناس:** بەدەنگ‌وناو، بەرێز لە ناو خەڵکا ف نامی، سرشناس.

**سەرنامە:** ١) دەست پێکی نوسین؛ ٢) پێناس ف ١) شروع نامە؛ ٢) شناسنامە.

**سەرنانەسەر:** سەرخستنەسەر ف سر بەسر گذاشتن.

**سەرنانەوە:** ١) داپۆشینی دەفر: (سەری مەنجەڵەکە **بنێوە**)؛ ٢) ئاوارەبوُن؛ ٣) بریتی لە مردن؛ ۴) بریتی لە خەوتن ف ١) سرپوش بر ظرف گذاردن؛ ٢) آوارە شدن؛ ٣) کنایە از مردن؛ ۴) کنایە از خفتن.

**سەرناو:** لەقەم، ناوێك دەگەڵ ناوی منداڵی ف لقب.

**سەرناوکانە:** پاداشتی مامان کە ناوکی ساوا دەبڕێ ف انعام بە ماما برای بریدن ناف نوزاد.

**سەرنج:** وردەوەبوُن، بەزیتی روانینی شتێك ف دقّت.

**سەرنجدان:** لێ وردەوەبوُن ف دقّت کردن.

**سەرنج دەر:** وردەکارو بیرکەرەوە ف پژوهندە.

**سەرنجە:** ١) سەرنج؛ ٢) سەربەرەژێر ف ١) دقّت؛ ٢) نشیب.

**سەرنخوُن:** ژێروژوُر، قلّپ ف سرنگون، نگون.

**سەرنزم:** سەرشۆڕ ف سرافکندە.

**سەرنسوڤ:** سەربەرەژێر، سەرنشێو ف سراشیبی.

**سەرنشیڤ:** سەرنسوڤ ف سراشیبی.

**سەرنڤویس:** چارەنوس ف سرنوشت.

**سەرنڤیسی:** ١) سەرژماری خەڵکی وڵات؛ ٢) نوسینی وتاری سەرەکی ف ١) سرشماری؛ ٢) نوشتن سرمقالە.

**سەرنڤیسار:** سەرەك نوسەر ف رئیس هیأت تحریریە.

**سەرنڤیشت:** چارەنوُس ف سرنوشت.

**سەرنقوت:** سەرەونخون. بۆ خنکاو *لە ئاودا دەڵێن* ف غرق شدە.

**سەرنگوُم:** سەرنخوُن ف سرنگون.

**سەرنوخوُن:** سەرنخوُن ف سرنگون.

**سەرنۆگە:** رەئیسی داروغە ف سرداروغە.

**سەرنوُس:** سەرژمێر ف آمارگر، سرشمار.

**سەرنەخت:** سەرقەلەن، هەرچی زیاد لە شیربایی بۆ بەشودان بدرێ ف آنچە کە اضافە بر شیربها دادە می‌شود.

**سەرنەخوُن:** سەرنخوُن ف سرنگون.

**سەرنەخوُنك:** گوڵەشلیرە ف نگا: گوڵەشلیرە.

**سەرنەخوِین:** سەرنخوُن ف سرنگون.

**سەرنەمە:** سەرشۆڕ، سەرنزم ف سرافکندە.

**سەرنەوق:** جنگن، روُهەڵمالاو، بێ‌شەرم‌و شورەیی ف ستیزەجو، بی‌شرم و حیا.

**سەرنەوەر:** سەرنزم، سەرشۆڕ ف سرافکندە.

**سەرنەوی:** سەرشۆڕ، سەرنزم ف سرافکندە.

**سەرنێ:** سەردۆڵ ف نگا: سەردۆڵ.

**سەرنیا:** دەمەزەرد ف نگا: دەمەزەرد.

**سەرنیان:** بریتی لە رۆیشتن‌و ئاوارە بوُن ف کنایە از متواری و آوارە شدن.

**سەروْ:** بیرێك کە لە نادیارەوە بە دڵ دەگا ف الهام.

**سەروُ:** ١) لای ژوُرو؛ ٢) دارێکی راست‌و بێ‌بەرو گەڵادەرزیە ف ١) طرف بالا: ٢) درخت سرو.

**سەروا:** پاشڵی شێعر، قافیە ف قافیۀ شعر.

**سەروادان:** سەربادان ف نگا: سەربادان.

**سەروار:** سەربار ف نگا: سەربار.

**سەرواز:** ١) سەرئاواڵە؛ ٢) چەکداری دەوڵەت؛ ٣) سەرڕێژ: (ئیمشەو تەنیایی جەستەی زەبوُنم / دیسان **سەرواز** کەرد دڵەی پڕهوُنم) «مەولەوی» ف ١) سرگشادە؛ ٢) سرباز؛ ٣) لبریز.

**سەروازخانە:** سپاگە، بنکەی چەکدارانی دەوڵەت ف پادگان.

**سەروازگیری:** سەربازگرتن ف سربازگیری.

**سەروازی:** سەربازی ف سربازی.

**سەروبن:** ١) ژێروژوُر؛ ٢) لەم سەر تا ئەو سەر: (بازاڕم **سەروبن** کرد گیر نەکەوت)؛ ٣) نەخۆشی منالان کە سەری مانگ‌و بنی مانگ دەیگرن ف ١) زیر و زبر؛ ٢) از این‌سو تا آنسو؛ ٣) نوعی بیماری کودکان کە در سلخ و غرّۀ ماه عود کند.

**سەروبەر:** ١) بەتەواوی، تەواو: (چیتەکە **سەروبەر** بەشی کرد)؛ ٢) سازی‌و ئاسودەیی لەژیاندا ف ١) کاملا بدون نقص: ٢) سر و سامان.

**سەروبەند:** چاخ، دەم، تاف: (لەو **سەروبەندەدا** جوان بوُم) ف اوان، هنگام.

**سەروبەندبەستن:** کارتەواوکردن، ئامادە کردن ف آمادە کردن.

**سەروبەندگرتن:** سەروبەندبەستن ف آمادە کردن تمام.

**سەروپا:** پەل‌و سەری حەیوان ف کلّەپاچە.

**سەروپاچك:** پەل‌و سەری ئاژاڵ بەبڕدراوی ف کلّەپاچە.

**سەروپۆتڕاك:** ١) تەحرودیدار؛ ٢) دیمەنی سەرپێچ‌و مێزەر ف ١) سروسیما؛ ٢) منظر عمامە و کلاە.

**سەروپۆتلاك:** سەروپۆتڕاك ف نگا: سەروپۆتڕاك.

**سەروپۆتەلاك:** سەروپۆتڕاك ف نگا: سەروپۆتڕاك.

**سەروپۆرت:** بۆ هەرکەسێ کەمێك ف سهم اندك برای هر کسی.

**سەروپۆرتك:** سەروپۆتڕاك ف نگا: سەروپۆتڕاك.

**سەروپەچك:** سەروپۆتڕاك ف نگا: سەروپۆتڕاك.

**سەروپێ:** سەروپا ف نگا: سەروپا.

**سەروپێچ:** پارچەی لەسەر بەستراو ف دستار.

**سەروتاوە:** گوندێکی کوردستان کە بەعسی ویرانی کرد ف از روستاهای کردستان کە بعثیان ویران کردند.

**سەروُتر:** ژوُرو، بڵندتر ف بالاتر.

**سەروْترە:** سەرفترە، ڕبەگەنمی سەرانە کە دوای رۆژوی رەمەزان بە فەقیر دەدرێ ف زکات فطر.

**سەروچاو:** دەم‌وچاو، ڕوُ، روخسار ف رخسارە.

**سەروچاوە:** ١) سەرچاوە؛ ٢) ناوی گوندێکە بەعسی وێرانی کرد ف ١) سرچشمە؛ ٢) نام دهی کە بعثیها ویران کردند.

**سەروچاوێ:** ١) سەرچاوە؛ ٢) ناوی گوندێکە ف ١) سرچشمە؛ ٢) نام دهی.

**سەروخوار:** هەردو ئالی باڵاو پاین ف بالایی و پایینی.

**سەرودەر:** زانین، تێ‌گەیشتن: (لەم کارە **سەرودەر** دەرناکەم) ف درك، فهم.

**سەرودەروو:** سەرودەر ف درك، فهم.

**سەروزمـان:** ۱) تابشتی زۆرکـەم: (بێ **سەروزمان** کەوتوە)؛ ۲) زمان پاراوی: (پیاوێکی بە **سەروزمانە**) ف ۱) رمق، نا؛ ۲) زبان‌آوری.

**سەروزو:** سەروزمان ف نگا: سەروزمان.

**سەروزوان:** سەروزمان ف نگا: سەروزمان.

**سەروزیاد:** بەشی تەواو ف کافی و زیادە.

**سەروژێر:** ۱) سەرو خوار؛ ۲) پێڵاوی پینە لێ‌دراوی سەرتازە؛ ۳) دو لە بزاوەکانی سەر پیتی نوسراو؛ ۴) سەرنخوُن؛ ۵) ژێر وژوُر، کاول، وێران ف ۱) بالایی و پایینی؛ ۲) کفش پینـەزدە؛ ۳) زیر و زبر اعراب؛ ۴) نگون؛ ۵) ویران.

**سەروساخت:** ساخت‌وپاخت، کەین‌وبەین ف تبانی.

**سەروسەکوت:** تەرح‌و دیدار، بیچم ف سر وسیما.

**سەروسەنەمە:** پێوقەدەم: (ئەم ئاغایە **سەروسەنەمە**ی باش نەبوُ) ف یمن.

**سەروسیما:** سەروسەکوت ف سر وسیما.

**سەروشـــك:** ۱) نەزان، تێ‌نەگەیشتـو، نازیرەك؛ ۲) سەرسـەخت؛ ۳) ئەسپی ڕا نەهێنراو ف ۱) کودن، نفهم؛ ۲) سرسخت؛ ۳) اسب رام نشدە.

**سەروشـوێن:** شوێنـەوار، ئاسـەوار: (وفایی ئاخری خێر بێ دەمێکە بێ **سەرو شوێنە**) ف رَد، اثَر.

**سەروشەدە:** سەروپێچ ف دستار.

**سەروقلخ:** سەروسەکوت ف ریخت، سر وسیما.

**سەروقوُن:** پێچەوانە ف برعکس، وارونە.

**سەروك:** ۱) سەراك، کوڵکەی شانەکراو؛ ۲) سەردار، سەرگەورە، رەئیس؛ ۳) شتێ کە مەلـەوان لەسـەر سەری دادەنێ بۆ پەڕاندنەوە؛ ۴) دۆکی رۆنی داغ کراو ف ۱) نگـا: سەراك؛ ۲) رئیس؛ ۳) چیزی کە شناگر برای عبور دادن بر سر گذارد؛ ۴) کف روغن داغ شدە.

**سەرۆك:** دەسماڵی سەری ژنان ف روسری.

**سەروکار:** پەیوندی، ئاشنایەتی ف سر وکار.

**سەروکـــانی:** ۱) سەرکـانی، سەرچـاوە؛ ۲) ناوی گونـدێکـە ف ۱) سرچشمە؛ ۲) نام دهی.

**سەرۆکایەتی:** سالاری، سەرداری ف ریاست.

**سەروگوێ:** لك‌و چوکڵەی دار ف پرزە و شاخە درخت.

**سەروگـــوێ کردن:** هەڵپـەرتـاوتن، قەیچی کردنی دار، پەرتـاوتن ف پیراستن درخت، هرس.

**سەروگوێلاك:** سەروپوتڕاك ف ریخت و قیافە.

**سەرومـــاڵ:** برێتی لە هەرچی هەیەو خۆشـەویستـە: (**سـەرومـاڵم** بەقوربانی ئازادی) ف کنایە از هستی و مُتعلقات آدمی.

**سەرومڕ:** تەواو، بێ کەم‌و زیاد، سەرو زیاد ف کافی، بدون کم‌و کاستی.

**سەرومیت:** وشەیەکە لە بازی کەلاێن‌دا ف اصطلاحی در تیلەبازی.

**سەرومێزەر:** سەروپێچ ف سر ودستار.

**سەروناو:** وشەیەکە لە بازی سنجۆقێن‌دا ف اصطلاحی در بازی «سنجوقێن».

**سەرەوە:** ۱) دولکـە، سەردولکـە، بەمـردو هەڵگـوتن؛ ۲) سەربە: (ئێمە **سەرەوە** عەشیرەتی جافین)؛ ۳) سەرقە، لای سەرەوە ف ۱) نوحە؛ ۲) منسوب بە؛ ۳) بالایی.

**سەرۆهـار:** سەرنـزم، سەرداخستـو، برێتی لە خەجاڵەت ف سرافکندە، کنایە از شرمسار.

**سەرەوەر:** سەرگەورە، سەردار، سالار ف سرور.

**سەرەوەری:** پایەبەرزی، سەرداری ف سروری.

**سەرەوەستا:** ۱) سەرۆکی وەستاکاران؛ ۲) لای وەستا، لجەم هۆستا؛ ۳) نزیك بە مردن: (زۆر نەخــۆشــە لە **سەرەوەستـــایە**) ف ۱) رئیس استادکاران؛ ۲) نزد استادکار؛ ۳) بیمار مردنی.

**سەرەوەسەر:** مامڵەی یەك‌بەیەك گۆڕینەوە ف پایاپای.

**سەرەوەسەرە:** سەربەسەرە ف نگا: سەربەسەرە.

**سەرەوەسەرێ:** سەربەسەرە ف نگا: سەربەسەرە.

**سەرەوەسیەت:** سەرەوگرد ف وصی، قیّم.

**سەرەوەش:** سەرخۆش ف شاد، مست.

**سەرەوەشێن:** شاخـدارێ کە بە شاخ دەخـەڵـك هەڵـدەدا؛ ۲) تاڤگـە، سوُلاف، ئاوهـەڵدێر؛ ۳) ئێکەم بەرهەمی کونجی ف ۱) شاخ‌زن؛ ۲) آبشار؛ ۳) اولین محصول کنجد.

**سەرە:** ۱) گوێزی دەسکـە للا؛ ۲) نۆبـە، باو، هەل؛ ۳) کارامـە، بۆ ژن دەڵێن، کابـان؛ ۴) دوبـەهارە بۆ مریشك؛ ۵) گاڕەشی سەرچۆپی لە گێرەدا، بەرانبـەری بنە: (بنەی خۆی ناکاو لە **سەرەی** خەڵك خێرایە)؛ ۶) بۆشانە، سەرانە لە ئاژەڵی رەعیەت ساندن ف ۱) گردویی کە بجای تیلە باشد؛ ۲) نوبت؛ ۳) کدبانوی مجرّب؛ ۴) مرغ دو بهار دیدە؛ ۵) حیوان سردستە در خرمن کوبی؛ ۶) باج از حیوانات رعیّت گرفتن مالك.

**سەرە:** زەڕە، هاوار کردنی کەر ف عرعر.

**سەرهات:** بەسەرهات، ڕوداو، ڕودای ف رویداد.

**سەرهاتن:** سەرهات ف رویداد.

**سەرهـاتن:** لەخـۆشیان‌دا سەر لێ شێوان ف از فرط راحتی راە و رسم زندگی را فراموش کردن.

**سەرهاتی:** سەرهات ف رویداد.

**سەرهار:** بزۆز ف بازیگوش، ناآرام.

**سەرهاڕ:** بەردی سەروی ئاسیاو، بەرداشی سەرەوە ف سنگ آسیای بالایی.

**سەرەبزوُت:** بزوُت، بزۆت، بسۆت ف نیمسوز.

**سەرەبەهار:** رۆژانی تازەبەهار ف نو بهار، اوایل بهار.

**سەرەت:** بێژنگی کون گەورە، کەو ف سرند.

**سەرەتا:** ۱) ئێکەم سەری دەزو؛ ۲) دەست پێك، پێش‌وتار ف ۱) سرنخ؛

۲) آغاز، شروع.
**سەرەتـاتکێ:** سەرکێشـان، سەرقوتان، روانین بەدزیەوە ف فضولانه و دزدکی نگاه کردن.
**سەرەتایی:** بەرایی، پێشونەی هەرشتێ ف مقدماتی.
**سەرەتەشی:** دارێکی خڕی کونە لەکن نوکە تەشیەوە ف کلّه دوك نخ ریسی.
**سەرەتیر:** نوکی سێ سوچ و تیژی تیر ف سرپیکان، ناوك.
**سەرەجە:** نەخۆشیەکی ولاّخە کە سەرو لەشی دەماسێ ف نوعی بیماری دام و ستور.
**سەرەچەرم:** ۱) چەرمی سەری رەشەماڵ؛ ۲) برێتی لە زەرەرو زیان ف ۱) چرم سر دام؛ ۲) کنایه از زیان.
**سەرەچەرم دان:** زەرەردان، زیان وێکەوتن ف کنایه از زیان کردن.
**سەرەخۆ:** هێدی، بەسەبر ف شکیبا.
**سەرەخۆرە:** منالێ کە زوُ باوکی بمرێ، واتا پێ و قەدەم شوُم ف نوزادی که پدرش بمیرد، کنایه از بدقدم.
**سەرەخولێ:** ۱) سەرگێژی؛ ۲) نەخۆشی سەرسامی ف ۱) سرگیجه؛ ۲) بیماری سرسام.
**سەرەخەر:** ۱) برێتی لە خوێنتاڵی کارتێك دەر؛ ۲) سەرناز، بەخۆدادەر ف ۱) کنایه از مزاحم گرانجان، سرخر؛ ۲) رختخواب.
**سەرەخەری:** گەگری، پێ‌چەقاندن، پەلّپ‌گرتن ف لجاجت، لجبازی.
**سەرەد:** سەڕەت، سەڕەد، کەو ف سرند.
**سەڕەد:** سەڕەت، کەو ف سرند، غربال درشت.
**سەرەدوگ:** سەرەتەشی ف کلّه دوك نخ‌ریسی.
**سەرەدەر:** ۱) دەرەتان؛ ۲) سەرودەر ف ۱) راه نجات، مفرّ؛ ۲) فهم، درك.
**سەرەدەنگ:** ۱) بوگێڕانەوەی گورانی؛ ۲) بەستەی دوای گورانی درێژ ف ۱) بازگفتن مقطعی از ترانه؛ ۲) تصنیف بعد از آواز.
**سەرەڕا:** سەرڕا، دەگەڵ ئەوەشا ف علاوه بر.
**سەرەڕم:** نوکەنێزەی درێژ ف سرنیزهٔ بلند.
**سەرەڕو:** ۱) کەسێ کە بێ بیرکردنەوە کارێ دەکا؛ ۲) بارەبەرێ کە پێش کاروان دەکەوێ و دوُر دەکەوێتەوە ف ۱) کسی که خودسر و بی‌تدبیر کار می‌کند؛ ۲) ستوری که از کاروان جلو افتد و دور شود.
**سەرەڕویی:** کاری سەرەڕو ف عمل «سەرەڕو».
**سەرەڕێ:** بانڕا، سەری ڕێکێ ف سر راه.
**سەرەڕێگە:** سەرەڕێ ف سر راه.
**سەرەژن:** ژنی ماڵداری کارامە، کەیوانوی خاس ف زن خانەدار کدخدامنش.
**سەرەژێر:** بەرەوخوار ف سرازیر.
**سەرەژێرە:** سەربەرەوخوارە، سەربەرەوژێرە ف سرازیری.
**سەرەستورکە:** جوُرێ کرمی ناوزگ ف نوعی کرم شکم.
**سەرەسودرە:** مایەفیتنە، ئاژاوەچی ف فتنه‌انگیز.
**سەرەسوُڕە:** سەرەگێژە ف سرگیجه.
**سەرەسوُڕێ:** سەرەسوُڕە، سەرەگێژە ف سرگیجه.
**سەرەسەبیلە:** سەرێکە لە کانزای زەرد دەکرێ بو سەبیلی توتن‌کێشان ف سرچپق از فلز.
**سەرەشك:** سەروشك ف نگا: سەروشك.
**سەرەشکێنە:** سەرشکێنە ف نگا: سەرشکێنە.
**سەرەفراز:** سەربڵند، خاوەن ئابڕو ف سرفراز.
**سەرەڤراز:** بەرەوبڵندایی، ئەڤرازی ف سربالایی.
**سەرەقەندە:** ۱) سەرەسەبیلە؛ ۲) سەری قلیان‌ئاوی ف ۱) سرچپق؛ ۲) سر قلیان.
**سەرەقەنگە:** سەرەقەندە ف نگا: سەرەقەندە.
**سەرەقەننە:** سەرەقەندە ف نگا: سەرەقەندە.
**سەرەك:** ۱) سەروك؛ ۲) درشتەی سەربێژنگ؛ ۳) داری دوفلیقانەی دڕك کوکردنەوە ف ۱) نگا: سەروك؛ ۲) بر غربال باقیمانده؛ ۳) چوب دوشاخهٔ خار جمع کنی.
**سەرەگێژە:** سەرگێژی، سەرەسوُڕە ف سرگیجه.
**سەرەمر:** مریشکی دوبەهاردیتو ف مرغ دو بهار دیده.
**سەرەمریشك:** سەرەمر ف نگا: سەرەمر.
**سەرەمژانە:** سەرمژانە ف نگا: سەرمژانە.
**سەرەمەرگ:** دەمی ئاویلکەدان ف حالت نزع.
**سەرەمەقەست:** برشتی لە جلك بڕین باقی‌مـ[illegible]رش باقیمانده از قیچی‌بری.
**سەرەمێر:** پیاوی کامڵ و لەچل‌ساڵ بە بالاّ ف سرەمرد، مرد میانسال.
**سەڕەن:** سەڕەت، سەرەد، کەو ف سرند.
**سەرەنـاز:** ۱) سەرنـاز؛ ۲) لاکێش، مافوُرەی درێژوکـە، کەنارە ف ۱) سرانداز؛ ۲) قالی کناره.
**سەرەند:** سەڕەت، سەرەد ف سرند.
**سەڕەند:** سەڕەت، سەرەد ف سرند.
**سەرەنداز:** سەرەناز ف نگا: سەرەناز.
**سەرەنگا:** ۱) بالگە، باڵشت؛ ۲) لای سەروُ ف ۱) بالش؛ ۲) طرف بالایی.
**سەرەنگرێ:** ۱) ڕەت‌بردە، هەڵەنگوُتە؛ ۲) ڕەت‌بردن، هەڵەنگوُتن ف ۱) سکندری خورده؛ ۲) سکندری.
**سەرەنگیا:** بالگە ف بالش.
**سەرەنوێلك:** سەرانگوێلك ف سرگینگاه، شوله.
**سەرەنیك:** دەسماڵێکی حەریری ژنەبازێڕیانە ف نوعی پارچه است.
**سەرەو:** بەرەوبان، لای ژوُرو ف طرف بالا.
**سەرەوار:** سەربەرەژێر ف سرازیر، فرود.
**سەرەوارە:** سەربەرەژێرە ف سرازیری.
**سەرەوچێر:** سەربەرەولێژایی، بەرەوخوارە ف سراشیبی.
**سەرەوخوار:** سەر بەرەژێر، سەرەوار ف سرازیر.
**سەرەوخوار کردنەوە:** ۱) بەرەو بەرەژێر بردن؛ ۲) نخوُن کردنەوەی دەفر ف ۱) سرازیر کردن؛ ۲) وارونه کردن ظرف.

**سەرەوخوارە:** سەر بەرەژێرە ف سرازیری.

**سەرهۆز:** سەرۆك عەشیرەت ف سردار ایل.

**سەرەوژوور:** سەر بەرەژوور ف سر بالایی.

**سەرەوژێر:** سەر بەرەژێر ف سرازیر.

**سەرەوژێرە:** سەر بەرەژێرە ف سرازیری.

**سەرهۆستا:** سەروەستا ف استادباشی.

**سەرەوكار:** سەركار ف نگا: سەركار.

**سەرەوكۆ:** بەرەوژوورە، سەرەو ژوورایی ف سر بالایی.

**سەرەوگرد:** كەسێ كە پاش مردگ بەسەر ماڵو منالّی رادەگا ف وصی، قیّم.

**سەرەولێژ:** ئاماڵ سەرەوژێر ف مایل به سرازیری.

**سەرەولێژە:** سەر بەرەژێرە ف سرازیری.

**سەرەولێژی:** سەرەولێژە، سەر بەرەژێرە ف سرازیری.

**سەرەوناو:** سەرەولێژ، ئاماڵ سەرەوژێر ف سراشیبی اندك، مایل به سرازیری.

**سەرەوناوە:** سەرەوناو ف سراشیبی اندك.

**سەرەونخوون:** سەرنخوون ف سرنگون.

**سەرەونگوم:** سەرنخوون ف سرنگون.

**سەرەونگوون:** سەرنخوون ف سرنگون.

**سەرەوگـــرد:** كەسێ كە لەپـــاش مردو بەســـەر ماڵو منـــاڵی رادەگا، سەروەسیەت ف وصی، قیّم.

**سەرەوە:** لای سەرو، بەرانبەری لای خوارو ف سمت بالایی.

**سەرهۆیشت:** سەرۆشت ف نگا: سەرۆشت.

**سەرهەڵدان:** پەیدابوونی دوای ونبوون ف پیدا شدن بعد از گم شدن.

**سەرهەڵگرتن:** ۱) دەرپەڕین و راكردنی ئەسپ بێ دەستەڵاتی سوار؛ ۲) برێتی لە ئاوارەبوون ف ۱) لجام گسیختن اسب؛ ۲) كنایه از آواره شدن.

**سەرهـەڵێنـان:** ۱) سەر بەرزەوە كـردن؛ ۲) سەربـزێوی؛ ۳) برێتی لە چاكتر بوونی نەخۆش ف ۱) سر بلند كردن؛ ۲) تمرّد؛ ۳) كنایه از بهتر شدن بیمار.

**سەرهـەنـگ:** ۱) داكی مێشـەنگـوینـان، شاهـەنـگ؛ ۲) پلەیەكە لە سەروازی؛ ۳) ناوە بۆ پیاوان ف ۱) زنبـور مادر، ملكـهٔ زنبـوران؛ ۲) سرهنگ؛ ۳) اسم مردانه.

**سەرهەنگاوتن:** دەست لەبان سەردانان بۆ ڕێزگرتنی كەسێ ف دست بر سر نهادن برای احترام.

**سەرهیچك:** جۆرێ ماسی ف نوعی ماهی.

**سەرهیشك:** سەرۆشك ف نگا: شەرۆشك.

**سەری:** ۱) نۆبـــە؛ ۲) پاژ؛ ۳) كۆمـەڵ، ئابـورە؛ ۴) یەكبن، سەلـك: (**سەری** پیازەكە كوا؟، **سەری** سیرم خوارد) ف ۱) نوبت؛ ۲) قسمت، سهم؛ ۳) توده؛ ۴) واحدی برای سیر و پیاز و...

**سەریال:** ۱) زینو، ملەی كێو؛ ۲) كەنارەی كێو ف ۱) گردنه؛ ۲) ستیغ.

**سەری پیری:** رۆژگاری پیری ف پیرانەسر.

**سەریت:** ساقەتەی دەخڵ، كلۆش ف ساقهٔ غلّه.

**سەرێش:** ئامرازی جووت بە تێكڕایی ف ابزار شخم‌زنی عموماً.

**سەرێشان:** ۱) ژانەسەر؛ ۲) دەردی سەر ف ۱) سردرد؛ ۲) دردسر.

**سەرێشە:** سەرێشان ف نگا: سەرێشان.

**سەریلۆك:** گۆرانیو ئاهەنگی تایبەتی بۆ بەهارهاتن ف ترانهٔ مخصوص رسیدن بهار.

**سەرین:** ۱) بالگە، باڵشت؛ ۲) شیاكە، ریخ، سنێر ف ۱) بالش؛ ۲) سرگین.

**سەرێن:** ماوەی ژیان: (لە **سەرێن خۆیا** وەسیەتی كردبو) ف دوران زندگی.

**سەرینگا:** ۱) بالگە؛ ۲) سەرانوێڵك ف ۱) بالش؛ ۲) شوله.

**سەرێنی:** ماوەی ژیان ف دوران زندگی.

**سەریەك:** ۱) تێكڕایی؛ ۲) لەبان یەك ف ۱) رویهم؛ ۲) بالای همدیگر.

**سەعات:** سەحات ف نگا: سەحات.

**سەعبلنە:** ئانی بەیانی ف صبحانه.

**سەعدانی:** سادانی، جۆرێ ترێ ف نوعی انگور.

**سەعـداوا:** گوندێكی كوردستانە بەعسی وێرانی كرد ف از روستاهای ویران شده كردستان توسط بعثیان.

**سەعلەب:** گیای سارمە ف گیاهی است.

**سەعۆ:** سووكەڵەناوی سەعید ف مخفّف نام سعید.

**سەعە:** سەعۆ ف مخفّف نام سعید.

**سەعەند:** سەحەند ف تشت كوچك.

**سەعی:** ۱) تەقالا، كوششت؛ ۲) سوكەڵە ناوی سەعید ف ۱) كوشش؛ ۲) مخفف نام سعید.

**سەغبیری:** چاولێ بوون، سەرپەرستی ف نگهداری

**سەغدە:** سەدەقە، خێرلەڕای خوادا ف صدقه.

**سەغڵەت:** سەخڵەت ف نگا: سەخڵەت.

**سەغی:** سەخی، دڵاوا ف سخی، دست و دلباز.

**سەغیر:** سەخیر، سێوی، منالّی بێ‌باب ف یتیم.

**سەف:** ریز، زنجیرە، شتی بەپاڵ یەكەوە ف صف، ردیف.

**سەفا:** ۱) دیمەنی جوانو هەواخۆش: (وڵاتێكی باسەفایە)؛ ۲) ئاشتی ف ۱) منظرهٔ دشت زیبا و خوش آب و هوا؛ ۲) صلح، آشتی.

**سەفاخانە:** ناوچەیەكە لە كوردستان ف ناحیه‌ای در كردستان.

**سەفان:** زنجیرەی چیا ف سلسله‌جبال.

**سەفت:** ۱) لە دەفتـەری میریدا نووسینی پسـولـەی مڵكو...، تاپـۆ؛ ۲) كۆڵەكەی ئەستوروبڵند ف ۱) ثبت؛ ۲) ستون بلند و قطور.

**سەفتـە:** لەسـەریەك دانـان: (قاقەزەكان **سەفتە** بكە) ف برهم نهادن، برهم چیدن.

**سەفدڕ:** بوێر، ئازا لە شەڕا، نەترس، بەجەرگ ف شجاع، رزم‌آور.

**سەفرا:** زەرداو ف صفرا.

**سەفۆر:** سمۆرە ف سمور.

**سەفۆری:** سمۆرە ف سمور.

**سەفەر:** لە ئاواییەکەوە بۆ ئاواییەکی تر ڕۆیشتن ف سفر.
**سەفەربەر:** ڕەشبگیر ف بسیج عمومی.
**سەفی:** ۱) کەم ئاوەز، حۆل؛ ۲) ناوە بۆ ژنان ف ۱) خل، سفیه؛ ۲) اسم زنانه.
**سەفیج:** کەم ئاوەز، سەفی ف خل، سفیه.
**سەفیك:** ۱) هەیوانۆکە؛ ۲) پاڵوێنە ف ۱) تراس کوچك؛ ۲) صافی.
**سەفین:** ۱) سەفـان؛ ۲) ناوی چیایەکی بەرزە لە کوردستان؛ ۳) ناوی پیاوانە ف ۱) رشته کوه؛ ۲) نام کوهی در کردستان؛ ۳) نام مردانه.
**سەفیە:** ناوی ژنانە ف نام زنانه.
**سەڤی:** سەبەتە ف سبد.
**سەق:** ۱) داربەڕوی زۆر ئەستور؛ ۲) ساوینی تیخ بۆ تیژکردن ف ۱) تنهٔ بلوط بسیار قطور؛ ۲) سوهان زدن تیغ.
**سەقا:** ۱) ئاوکێش؛ ۲) تەکوُز، ڕێك وپێك؛ ۳) تێراوی ف ۱) آبکش، سقّا؛ ۲) نظم، ترتیب؛ ۳) سیراب شدن.
**سەقادان:** تەکوُزکردن، ڕێك وپێك خستن ف ترتیب و تنظیم دادن.
**سەقـاقوش:** کەڵك، مەلێکی گەورەی دندوُك زلی سپی بۆرە بەرچیلەی شۆڕەو ماسی خۆرە ف پرنده‌ای ماهیخوار، پلیکان.
**سەقـــام:** ۱) تەکـوُزی، ڕێك وپێکی؛ ۲) بەرقـەراری، پایەداری ف ۱) تنظیم، ترتیب؛ ۲) پایداری، ثبات.
**سەقامگیر:** بەرقەرار، جێگرتو ف پایدار.
**سەقـاو:** ۱) نەخـۆشی ئیسقـایی یەکسم؛ ۲) ناوی جۆرێ ڕمب، ڕمبی سەقاو ف ۱) نوعی بیماری ستور؛ ۲) نوعی نیزه.
**سەقـاهـەڵگرتن:** تێراوبوُنی زەوی لە باران، پەڵەدان ف سیراب شدن زمین از باران.
**سەقر:** مەلێکی ڕاوە لە باز پچوُکتر ف چرغ، پرنده‌ای شکاری.
**سەقز:** شارێکە لە کوردستان ف شهری در کردستان.
**سەقلاو:** ناوی جۆرێ ڕمب، ڕمبی سەقلاو، ڕمبی سەقاو ف نوعی نیزه.
**سەقـەت:** ۱) مردارەوبـوُی یەکسم؛ ۲) عەیبدار، زەدەدار؛ ۳) خەتەر، بقە: (بیاوێکی **سەقەتە** ناوێرم بچمە لای)؛ ۴) وشەی گاڵتە پێ کردن لە ئەنجام نەدانی کارێ، تەڕ: (**سەقەت** نەهاتی، **سەقەت** نەت کرد)؛ ۵) ئاسنجـاو ف ۱) مردار ستور؛ ۲) زده‌دار، معیوب؛ ۳) خطر؛ ۴) کلمهٔ تمسخر و کنایه؛ ۵) قراضهٔ آهن.
**سەقـــەتفرۆش:** کەسـێ کاسـبیەکـەی ئاسنجــاو فروشتنـــە ف قراضه‌فروش، سقط فروش.
**سەقـەر:** ۱) بەستـەڵەك؛ ۲) گوندێکی کوردانە لەلای دیاربەکر ف ۱) نگا: بەستەڵەك؛ ۲) نام روستایی است.
**سەقەم:** سەرماو سۆڵەی زۆر دژوار ف سوز و سرمای سخت.
**سەقەمی:** جۆرێ نەخۆشی یەکسمە ف از بیماریهای ستوران.
**سەقی:** جۆرێ بەردی مەڕمەڕی زەردە ف نوعی سنگ مرمر زردرنگ.
**سەقیل:** ڕەزیل، ڕژد، چکوُس، دەس قوُچاو ف خسیس.
**سهك:** سرکە ف سرکه.
**سەکار:** ۱) ساقوُڕ؛ ۲) جۆرێ کورتانی ڕاست و ساف ف ۱) سبد بزرگ کاهکشی؛ ۲) نوعی پالان.
**سەکت:** مردار بوُنەوەی یەکسم، سەقەت ف مردار شدن ستور.
**سەکتە:** مەرگی لەپڕ و نەکاو، مەرگی مفاجا ف سکته، مرگ ناگهانی.
**سەکتە کردن:** لەنەکاومردن ف سکته کردن.
**سەکتە گرتن:** شەپلەلێدان ف سکتهٔ ناقص کردن و زمینگیر شدن.
**سەکتین:** مردنی یەکسم، سەقەت بوُن ف مردن ستور، سقط شدن.
**سەکـر:** ۱) داخستن، پێوەدانی دەرك و...: (دەرگاکـە **سەکـر** بکە)؛ ۲) هۆزێکی کوردە ف ۱) بستن و برهم آوردن در و پنجره؛ ۲) نام عشیرتی.
**سەکران:** ۱) ناوچەیەکە لە کوردستان؛ ۲) ناوی کێوێکە لە کوردستان ف ۱) ناحیه‌ای در کردستان؛ ۲) کوهی در کردستان.
**سەکرە:** زەرك، پیان ف ظرف آبخوری.
**سەکسار:** ۱) جۆرێ مەیمون؛ ۲) جوێنێکە واتا: وەك سەگ ف ۱) نوعی بوزینه؛ ۲) دشنامی است.
**سەکنی:** بەپێوە، ڕاوەستاو ف ایستاده.
**سەکنین:** ۱) ڕاوەستـان، بەپێوەبـوُن؛ ۲) داسـەکنان، ئارام‌بوُن ف ۱) ایستادن بر پا؛ ۲) آرام گرفتن.
**سەکۆ:** دکە، بەرزایی لە حەوزی چێکراو بۆ لەسەر دانیشتن ف سکو.
**سەکوت:** تەحر، بیچم: (لە سەرو **سەکوتی** بڕوانە) ف ریخت و سیما.
**سەکوُم:** سەکوت ف ریخت و سیما.
**سەکەت:** سەکت، سەقەت ف ستور مردار شده.
**سەکەماتی:** چەورەو خوێری و بێکارە ف ولگرد و هرزه، اوباش.
**سەکین:** ئاڵ بونەوەی ددان بەترشی ف کرخ شدن دندان از تُرشی.
**سەگ:** سە، سپەڕ، سپلۆت ف سگ.
**سەگاف:** جانەوەرێکە لە ئاوا دەژی و کونی لە دم ئاوە کەوڵی بەنرخە ف سگلاب، سگ آبی.
**سەگاڤی:** سەگاف ف نگا: سەگاف.
**سەگالا:** سەگاف ف نگا: سەگاف.
**سەگان:** زۆر سەگ ف سگها.
**سەگانە:** برێتی لە کاری فێڵاوی و حیلەبازی ف کنایه از حیله‌بازی.
**سەگانی:** حیلەباز ف حقه‌باز.
**سەگاو:** سەگاف ف نگا: سەگاف.
**سەگاوی:** سەگاف ف نگا: سەگاف.
**سەگایەتی:** برێتی لە فێڵبازی و ناراستی ف کنایه از حقه‌بازی و دغلی.
**سەگ بەحـەسـار:** ۱) برێتی لە هێنان و بردنی بێ‌فایدە؛ ۲) دارکاری و قیڕەو هەرا ف ۱) کنایه از بیهوده این سو و آن سو بردن؛ ۲) کتك‌کاری و دعوا.
**سەگ بەحەوش:** سەگ بەحەسار ف نگا: سەگ بەحەسار.
**سەگ پاسوتیاگ:** برێتی لە ماڵانگەری هەدانە دەر ف کنایه از ولگرد.
**سەگ پسێنکـە:** برێتی لە کەروێشکی بەهارەزێ لە پا یزدا ف کنایه از خرگوش بهاره‌زاد در پائیز.
**سەگ دەس:** چارەوێ کە لە ڕۆیشتنا ئەژنۆی وێك دەکەون ف سگدست،

چارپایی كه هنگام راه‌رفتن زانوهایش را بهم می‌زند.

**سه‌گ ده‌ست:** سه‌گ ده‌س ف نگا: سه‌گ ده‌س.

**سه‌گڕه‌و:** حه‌په‌ی سه‌گ ف پارس سگ.

**سه‌گڕه‌وین:** ۱) حه‌په كردن؛ ۲) ئه‌وه‌ی سه‌گ لێی بترسێ‌و بكشێته‌وه ف ۱) پارس كردن؛ ۲) آنچه سگ را بترساند.

**سه‌گ ڕه‌وێنه‌وه:** كه‌سێ كه سه‌گ لێی ده‌ترسن ف كسی كه سگها از او می‌ترسند.

**سه‌گسار:** ۱) ناحه‌ز، پیچم ناشیرین؛ ۲) جوێنێكه واتا: وه‌ك سه‌گ پیس ف ۱) بدقیافه؛ ۲) دشنامی است.

**سه‌گڵاو:** ۱) سه‌گاف؛ ۲) جوێنێكه، سه‌گی پیس ف ۱) نگا: سه‌گاف؛ ۲) دشنامی است.

**سه‌گڵاوك:** سه‌گڵاو واتا: سه‌گی گڵاو، جوێنه ف دشنامی است، سگ نجس.

**سه‌گڵاوی:** جۆرێ ره‌سه‌نی ئه‌سپ ف نوعی نژاد اصیل اسب.

**سه‌گلوُر:** ده‌نگ درێژ كردنه‌وه‌ی سه‌گ، حه‌په‌ی درێژی بێ‌بڕانه‌وه، لوُره ف زوزهٔ سگ.

**سه‌گ ماسی:** جۆرێ ماسی ف نوعی ماهی، سگ ماهی.

**سه‌گمان:** ئاماج، نیشانه، ئامانج ف آماج تیراندازی.

**سه‌گمه‌رگ:** كه‌سێ كه له‌مردنه‌و نامرێ: (مه‌پرسه بۆ له دوُری تۆ نه‌مردم / كه‌من سه‌گمه‌رگم‌و گیان سه‌خت‌و دڵڕه‌ق) «شێخ ره‌زا» ف جان‌سخت.

**سه‌گ مه‌رگی:** ده‌ردو ئازاری زۆر ف درد و رنج زندگی.

**سه‌گو:** سه‌گان ف سگها.

**سه‌گۆ:** ئه‌ی سه‌گ! ف ای سگ.

**سه‌گوان:** تیرهاوێژی زاناو زه‌برده‌ست، نیشانه‌نه‌نگێو ف تیرانداز ماهر، تك تیرانداز.

**سه‌گ وه‌ڕ:** حه‌په‌حه‌پی سه‌گان ف پارس گروهی سگها.

**سه‌گ وه‌ن:** ناوی هۆزێكی كورده ف نام عشیرتی كرد.

**سه‌گه:** ئه‌ی‌سه‌گ، وشه‌یه‌كه واتا: هه‌ی فێڵباز ف كلمهٔ خطاب به معنی ای حیله‌باز.

**سه‌گه‌بۆر:** سه‌گه، بریتی له فێڵباز ف نگا: سه‌گه.

**سه‌گه‌سه‌گه:** خۆگێل كردن‌و خۆ به‌سته‌زمان نیشان‌دان ف خود را به موش‌مردگی زدن، تظاهر به سادگی.

**سه‌گه‌ناز:** سه‌بنێسی ف بیماری كشندهٔ سگ.

**سه‌گه‌ناس:** سه‌گه‌ناز، سه‌بنێسی ف بیماری كشندهٔ سگ.

**سه‌گه‌وان:** ئاگاداری سه‌گ ف سگبان.

**سه‌گی پێ سوتاو:** بریتی له ماڵانگه‌ری هه‌دا نه‌ده‌ر ف كنایه از ولگرد.

**سه‌گێتی:** سه‌گایه‌تی ف نگا: سه‌گایه‌تی.

**سه‌گێنی:** سه‌گایه‌تی ف نگا: سه‌گایه‌تی.

**سه‌گی هار:** ۱) سه‌گێ كه نه‌خۆشی هاری گرتبی؛ ۲) بریتی له مرۆڤی شه‌ڕفرۆش ف ۱) سگ هار؛ ۲) كنایه از آدم ماجراجو.

**سه‌گیه‌تی:** سه‌گایه‌تی ف نگا: سه‌گایه‌تی.

**سه‌ل:** ۱) ته‌ڵاشه‌به‌رد، تڵیشه‌به‌رد؛ ۲) به‌ردی پان‌و ته‌نك؛ ۳) خڕ: (**سه‌ڵك** واتا: خڕی چكۆله)؛ ۴) ده‌فری پانی له‌توُڵه‌بی ته‌نراو، نانه‌شان: (سه‌ڵك واتا: سه‌له‌ی چكۆله) ف ۱) پلمه از سنگ؛ ۲) سنگ پهن و نازك؛ ۳) مدّور؛ ۴) آبكش بافته از تركه، سبد پهن، سبد طبقی.

**سه‌ڵا:** ۱) رۆژا پساتێ، رۆژی هه‌ستانه‌وه‌ی دوای مه‌رگ، په‌سڵان: (ئه‌یرۆ سه‌ڵام لێ ڕابو)؛ ۲) پاڕانه‌وه به ده‌نگی به‌رز بۆ پارشێوكردنی مانگی ره‌مه‌زان، مناجات؛ ۳) سڵا ف ۱) روز قیامت؛ ۲) مناجات سحری ماه رمضان؛ ۳) بلندیها.

**سه‌لاخ:** كه‌وڵ كه‌ر ف پوست كن، سلاخ.

**سه‌لار:** سه‌ره‌ژن ف كدبانوی محترمه و كدخدامنش.

**سه‌لاره:** ۱) سه‌لار؛ ۲) جوان‌و خوشیك ف ۱) نگا: سه‌لار؛ ۲) زیبا و دلكش.

**سه‌لارێ:** سه‌لار ف نگا: سه‌لار.

**سه‌لاقوُچكه:** خۆهه‌ڵگێڕانه‌وه ف پشتك.

**سه‌لاقوُچكانێ:** سه‌لاقوُچكه ف پشتك.

**سه‌لالیك:** ڕه‌وڕه‌وه ف چرخ راه رفتن یاد دادن بچه، كمك مادر.

**سه‌ڵان:** سڵا، به‌رزاییه‌كان ف بلندیها.

**سه‌لایه:** ده‌سكی ئاونگ ف دستهٔ هاون، یاور.

**سه‌لبه‌ند:** رێگه‌ی به‌ردتێ گیراو ف راه سنگفرش شده.

**سه‌لپ:** ۱) بێڵی كه‌ڵه‌ك لێ خوڕین؛ ۲) جۆرێ داره‌بی ف ۱) چوبی كه بدان كلك را هدایت كنند؛ ۲) نوعی درخت بید.

**سه‌ڵپ:** بێڵی به‌له‌م لێخوڕین، سه‌وڵ ف پاروی قایقرانی. .

**سه‌ڵپاندن:** پاڕوُڵێدان ف پاروزدن.

**سه‌ڵپی:** سه‌ڵپ ف نگا: سه‌ڵپ.

**سه‌ڵت:** ۱) ره‌به‌ن، بێ‌ژن؛ ۲) لاشه گۆشتی جگه له ده‌ست‌و ڕان؛ ۳) پیاده‌ی بێ‌هاوڕێ: (به‌سه‌ڵتی هاتم، **سه‌ڵت بوُم**) ف ۱) مجرّد؛ ۲) لاشهٔ گوشت بدون دست و ران؛ ۳) پیادهٔ تنها.

**سه‌ڵته:** ۱) سه‌رجلێكه له سه‌ر كه‌وای ئاو دامێنه‌وه ده‌به‌ر ده‌كرێ؛ ۲) ته‌نیا: (**سه‌ڵته سوار**) ف ۱) نوعی كت كوتاه كه روی قبای روحانیّت می‌پوشند؛ ۲) تنها.

**سه‌ڵته‌زه‌لام:** پیاده‌ی ته‌نیا ف پیادهٔ تنها.

**سه‌ڵته‌نه:** ناوی ژنانه ف نام زنانه.

**سه‌ڵته‌نه‌ت:** شایه‌تی، حكومه‌ت، پادشایی ف سلطنت.

**سه‌لڤی:** داری سه‌رو ف درخت سرو.

**سه‌لك:** ۱) سه‌ری بنیاده‌م‌و حه‌یوان؛ ۲) هه‌رشتێ خڕ هه‌ڵدراوی پڕبه‌مشت: (**سه‌لكه** ترخێنه، **سه‌لكه** ره‌ژی، **سه‌لكه‌**په‌نیر)؛ ۳) بنه‌گیای خڕو درشت: (**سه‌لكه‌**پیاز، **سه‌لكه** چه‌وه‌نده‌ر) ف ۱) كلّه؛ ۲) گلوله شده با دست؛ ۳) پیاز یا ریشه‌های غده‌ای گیاهان.

**سه‌ڵك:** سه‌به‌ته‌ی پچوُك، تریان ف سبد كوچك.

**سه‌ڵكدار:** گیای بن‌خڕ ف گیاه پیازدار.

**سه‌لكه:** ۱) جۆرێ نه‌خشی مافوُره؛ ۲) پیوازه‌ی گیا؛ ۳) بریتی له بنیاده‌می سه‌رزل ف ۱) نوعی گل قالی؛ ۲) پیازهٔ گیاه؛ ۳) كنایه از

سر گُنده.

**سەلکەبزۆت:** سەرەبزۆت، بسۆت ف نیمسوز.

**سەلما:** ناوی ژنانە ف نام زنانە.

**سەڵماس:** ١) سلّماس؛ ٢) گوندێکی کوردستانە بەعسی وێرانی کرد ف ١) شهر سلماس؛ ٢) روستایی در کردستان که بعثیان ویرانش کردند.

**سەلمانپیسە:** جۆرێ مارمێلکەی ژەهردارە ف نوعی سوسمار سمی.

**سەلماندن:** قەبوڵاندنی کارێك یا وتەیەك ف قبولاندن.

**سەلو:** داری سەرو ف درخت سرو.

**سەڵوات:** سڵاوات ف صلوات.

**سەڵوات ئاوا:** ناوی گوندێکە لەلای سنە ف نام دهی است.

**سەلوارەوان:** جۆرێ دارسەروی زۆر راستو رێك ف سرو سهی.

**سەلە:** نانەشان، سەبەتەی پان ف سبد طبقی، آبکش ترکەای.

**سەلەشیرك:** سەبەتەی زل بۆ دەفرو هەوڕ ف سبد بزرگ جاظرفی.

**سەڵەف:** ١) دانەلغاو؛ ٢) سوُتی پارە؛ ٣) پڕتاوبوُنی ئەسپ؛ ٤) قەرز، واو ف ١) دهانهٔ لگام؛ ٢) ربا؛ ٣) پُرتاب بودن اسب؛ ٤) وام.

**سەڵەفخۆر:** سوُتخۆر ف رباخوار.

**سەڵەفکردن:** ١) قەرزکردنی بەسوُت؛ ٢) پڕتاوکردنی ئەسپ ف ١) وام گرفتن با تنزیل؛ ٢) پُرتاب کردن اسب.

**سەلەگوُن:** گوندێکی کوردستانە بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**سەلەم:** پێشفرۆش ف سلم، پیش‌فروش.

**سەلەندە:** پاسارە، سوانە، سواندە ف کنارهٔ لب بام.

**سەڵیتە:** ژنی زماندرێژی بێحەیا ف زن بی حیا.

**سەلیقە:** ئاوەز، فام: (پیاگێ بەسەلیقەیە) ف سلیقه.

**سەلیلانْك:** سەلالیك، رەوڕەوە ف نگا: سەلالیك.

**سەلیم:** ١) بێئازار، هێدیو هێمن؛ ٢) ناوە بۆ پیاوان ف ١) آرام بی‌آزار؛ ٢) نام مردانه.

**سەلین:** بەردی سەر گۆڕیچە ف سنگ سرپوش لحد.

**سەم:** ١) دەرمانی گیاندار کوژ، ژەهر؛ ٢) سەگی من؛ ٣) من سەگم ف ١) سَمّ؛ ٢) سگ من؛ ٣) من سگم.

**سەما:** هەڵپەڕکێ، دیلان، رەقس ف رقص.

**سەماخ:** وەج، بێنیاز لە خەڵك، رێزلەخۆگر ف دارای عزّت نفس.

**سەماس:** ١) هێمن، پشولەسەرخۆ؛ ٢) جەوهەری تیغی شیرو خەنجەر ف ١) صبور، آرام؛ ٢) پرند.

**سەماسی:** کۆسەماسی ف کوسەماهی.

**سەماك:** زۆربەرزو بڵند ف مرتفع.

**سەماکەر:** کەسێ کە رەقس دەکا ف رقّاص.

**سەماگە:** جێداوەت ف جای رقص.

**سەماڵەك:** باڵدارێکی زلو زۆر قەڵەوە ف از پرندگان بزرگ‌جثه.

**سەماڵی:** کەوە، عابی ف آسمانگون.

**سەمانەك:** مەلێکی جنجیرە لە رەشوڵە زلترە زۆرتر هێلانە لە هەرزندا دەکا، هەوێردە ف بلدرچین، وشم.

**سەماوار:** ئامرازێکی چالێنانە ف سماور.

**سەماوەر:** سەماوار ف سماور.

**سەمبە:** ١) مەتکەو، ئامرازی دارکونکردن؛ ٢) ناوی گوندێکە ف ١) مته، سنبه، ابزار سوراخ کردن؛ ٢) نام دهی است.

**سەمت:** لا، ئالی، ڕەخ ف سو، طرف، سمت.

**سەمتوُر:** ئامرازێکی موُسیقایە ف یکی از آلات موسیقی، سنتور.

**سەمسیر:** تڵپی ترێ ف تفالهٔ انگور.

**سەموُر:** سفوُر، سفوُری، سڤوُر، سمۆرە ف سمور.

**سەمە:** سەمبە، مەتکەو ف سنبه.

**سەمەت:** ئارامی، حەوسەلە ف شکیبایی، آرامی.

**سەمەد:** هۆ. سەبەب ف انگیزه، سبب.

**سەمەر:** ١) سەرسوڕێن، عەجایب؛ ٢) کۆپانی چارەوێ ف ١) شگفت؛ ٢) پالان.

**سەمەرگی:** دەردو رەنجو شەکەتی ف مشقّت فراوان.

**سەمەرە:** ١) سەمەر: (شتێکی سەیرو سەمەرەیە)؛ ٢) ژانو دەرد؛ ٣) قەڵپوُزی زین؛ ٤) جیازی وْشتر؛ ٥) ژێرجلی کاتێ ئاخنراوی جگە لە کورتان؛ ٦) سەرگوروشتە ف ١) شگفت؛ ٢) رنج و آزار؛ ٣) زین کوهه؛ ٤) پالان شتر؛ ٥) نوعی پالان الاغ؛ ٦) سرگذشت.

**سەمەڵ:** گیای خراپی گێرەنەکراوی لێکهاڵاو ف علف بهم پیچیدهٔ نکوبیده.

**سەمەن:** ١) گوڵی یاسەمەن؛ ٢) زەردی کاڵ؛ ٣) رەنگی کەوە ف ١) گل سمن؛ ٢) زرد روشن؛ ٣) خاکستری رنگ.

**سەمەندۆك:** ساجوڕ ف ساجور.

**سەمەنگوڵ:** شەلێ کە زۆر کەم دەلەنگێ، شیرین شەل ف شلی که اندك می‌لنگد.

**سەمەنی:** هەڵوای لە شیرەی گەنمەفەریکەو ئارد ف سمنو.

**سەمیت:** ماکێکی رەش کە لە دەرگای خەڵیفە هەنگە ف ماده‌ای سیاه رنگ که جلو دَر کندوی زنبوران است.

**سەمید:** سەمیت ف نگا: سەمیت.

**سەمیر:** سەمسیر ف تفالهٔ انگور فشرده.

**سەنا:** سانا، ئاسان ف آسان.

**سەنامەکی:** سنامەکی ف نگا: سنامەکی.

**سەناهی:** ١) سانایی، ئاسانی؛ ٢) ئاسوُدەیی ف ١) آسانی؛ ٢) آسودگی.

**سەنتە:** ١) نهێنی؛ ٢) بێدەنگبوُن ف ١) سرّی؛ ٢) خاموشی.

**سەنتەنە:** ١) دەبدەبە، شکۆو جەلال؛ ٢) ناوە بۆ ژنان ف ١) دبدبه و شکوه؛ ٢) نام زنانه.

**سهنتی:** شەقەزیلە، عیشت، شەپازللە ف سیلی.

**سەندن:** ئەستاندن، ساندن ف نگا: ساندن.

**سەندنەوە:** ساندنەوە، ئەستاندنەوە ف نگا: ساندنەوە.

**سەندەڵ:** ١) دارێکی بۆنخۆشە؛ ٢) کەوشی لە دار، قاپقاپ، تەقتەقیلە؛ ٣) گیازەرتك ف ١) چوب صندل؛ ٢) دمپایی چوبی؛ ٣)

گیاهی که از آن رنگ زرد گیرند.

**سەندەلی:** کورسی لەسەردانیشتن ف صندلی.

**سەنگ:** ١) بەرد؛ ٢) قورسایی، کێش؛ ٣) برێتی لە قەدرو حورمەت: (پیاوێ بەسەنگە) ف ١) سنگ؛ ٢) وزن؛ ٣) کنایه از احترام و منزلت.

**سەنگا:** ١) بالگە، باڵشت، سەرین؛ ٢) بەردی دژی ژەهر، سەنگزاوەر ف ١) بالش؛ ٢) سنگ پادزهر.

**سەنگاتی:** قورسایی، گرانایی ف وزن، وزنه.

**سەنگان:** ١) تەخمین، بەراورد؛ ٢) تەجرەبە کردن، ئەزموون ف ١) ارزیابی؛ ٢) تجربه، آزمون.

**سەنگاندن:** ١) تەخمین کردن؛ ٢) تاقی کردنەوە، ئەزموون، زمین ف ١) ارزیابی کردن؛ ٢) تجربه کردن.

**سەنگانن:** سەنگاندن ف نگا: سەنگاندن.

**سەنگاو:** ناوچەیەکی چەندگوندی لە کوردستان بەعسی وێرانی کردن ف ناحیه‌ای شامل چند روستا در کردستان که بعثیان ویران کردند.

**سەنگایی:** سەنگاتی ف سنگینی، وزنه.

**سەنگباران:** بەردەباران ف سنگباران.

**سەنگتراش:** بەردتاش، نەقار ف سنگتراش.

**سەنگچن:** دیواری وشکەبەرد، ئیشکەکەڵەك؛ ٢) دەوری بیر لەناوەوە بە بەرد هەڵچنین ف ١) دیوار سنگ‌چین؛ ٢) دیوارهٔ چاه آب را سنگچین کردن.

**سەنگزاوەر:** ١) بەردی دژی ژەهر. بەردێکە *لایان وایە پێت بێ مارو دوپشك پێتەوە نادا* ف سنگ پادزهر.

**سەنگتەراش:** سەنگتراش، بەردتاش ف سنگتراش.

**سەنگ کێش:** شەڵتەی بەردکێشان ف ناوهٔ چوبی بر پشت باربر که سنگ بدان کشند.

سەنگ **لێ‌نان:** برێتی لە حورمەت گرتن ف کنایه از ارج نهادن.

**سەنگ لێ‌نیان:** سەنگ لێ نان ف کنایه از ارج نهادن.

**سەنگۆ:** گوێلپار، پانێر، پارێن ف گوسالهٔ یکساله.

**سەنگوبەرد:** لە ژێر شتیءگران داپۆشران ف زیر پوشش سنگین بودن.

**سەنگو بەردنان:** ژێر شتی گران دانان: (ماسیەکەم **سەنگوبەرد ناوە**) ف زیر پوشش سنگین گذاردن.

**سەنگۆرە:** گۆلکی زۆر گۆشتنی غلۆر ف گوسالهٔ چاق مغرور.

**سەنگورەنگ:** ڕێزوقەدر: (کاورایەکی وە**سەنگورەنگە**) ف ارج و ارزش.

**سەنگوسۆك:** سەنگاندن ف نگا: سەنگاندن.

**سەنگۆل:** ١) تەژەی دزێو؛ ٢) سەگی نێری زل، قەپەگۆڵ ف ١) قوی‌هیکل بدقواره؛ ٢) نره‌سگ قوی‌جثه.

**سەنگەر:** چەپەر، خەڵ، مەتەریز ف سنگر.

**سەنگەربەندی:** چەپەرکۆڵین ف سنگر بندی.

**سەنگەسار:** سەنگباران، بەردەباران ف سنگسار.

**سەنگەك:** نانێ کە لەسەر چەو ببرژێ ف نان سنگك

**سەنگەلا:** تاسەنگ، باری خوار ف بار کج.

**سەنگەلا:** ١) سەنگەلا؛ ٢) ڕاژان بەحەواوە ف ١) بار کج؛ ٢) نوسان.

**سەنگەڵ قۆ:** خۆتێ هەڵقوتێن، لاپرەسەن ف فضول.

**سەنگەلی:** سەندەلی ف صندلی.

**سەنگەوبەرد:** سەنگوبەرد ف نگا: سەنگوبەرد.

**سەنگی:** ١) لەبەرد چێکری؛ ٢) هێژا، بەنرخ ف ١) از سنگ ساخته؛ ٢) بهادار.

**سەنگیا:** بالگە، باڵشت ف بالش.

**سەنگی‌سەما:** جۆرێ دیلان ف نوعی رقص گروهی.

**سەنگی محەك:** بەردی زێڕئەزموون ف سنگ محك.

**سەنگین:** ١) بەکێش، قورس؛ ٢) مرۆی بەشەرمو ئاوەز ف ١) سنگین؛ ٢) باوقار.

**سەنگین‌وگران:** مرۆی لەسەرخۆی بە حورمەت ف آدم باوقار.

**سەنگینی:** ١) قورسایی، گرانی، دژی سوکی؛ ٢) شەرمو ئابڕوومەندی ف ١) سنگینی؛ ٢) وقار.

**سەنم:** پیس‌وگلاو ف نَجس.

**سەنماندن:** گلاوکردن ف نجس کردن.

**سەنمین:** گلاوبوون ف نجس شدن.

**سەنن:** ساندن، ئەستاندن ف نگا: ساندن.

**سهنه:** تارمایی، ڕەشایی نەناسراو لەدور ف شَبَح.

**سەنەت:** قەباڵە، نوسراو دەر بارەی مڵکەوە ف سند.

**سەنەد:** سەنەت ف سند.

**سەنەدۆك:** سەمەندۆك، ساجوڕ ف ساجور.

**سەنەڵ:** سەندەڵ، قاپقاپ ف دمپایی چوبین.

**سەنەلی:** سەندەلی ف صندلی.

**سەنیار:** شت‌سێن لە بازاڕ، کڕیار ف خریدار.

**سەنێر:** سنێر، شیاکە، سەرین ف سرگین.

**سەنیر:** بالگە، باڵشت ف بالش.

**سەنێرپێژ:** تەپاڵەپێژ، ژنێ کە تەپاڵە دروست ئەکا ف زنی که تاپاله می‌سازد.

**سەنێرگا:** سەرانگوێلك ف سرگینگاه، شوله.

**سەنێروانگ:** سەنێرگا ف سرگینگاه.

**سەنیره:** دارێکە لە کاتی وێستاندنی عەرابەدا بەر عەرابە دەدرێ تا کەڵ وەحەسێ ف ستونی که به‌منظور استراحت حیوان گاری‌کش زیر گاری می‌گذارند.

**سەنیری‌مار:** کرمێکی بەڵەکو هێدی هێدی دەخزێ ف نوعی کرم.

**سەنیك:** پارچەیەکی گرۆڤەری بەنەخش‌و دەرەجەیە وەك ڕوکاری سەعات‌و قیبلەنوما ف صفحهٔ منقش و تذهیب شده.

**سەنین:** ساندن ف نگا: ساندن.

**سەوا:** ١) ئاڵش وێرش، ئاڵوویر، مامڵە؛ ٢) سبەی؛ ٣) بەرەبەیان؛ ٤) جیا؛ ٥) وەك‌یەك، بەرانبەر؛ ٦) بۆخاتری، لەبەر، سەبا ف ١) معامله؛ ٢) فردا؛ ٣) بامداد؛ ٤) جدا، سوا؛ ٥) مساوی، برابر؛ ٦) برای، بخاطر.

**سەواد:** زانینی خوێندن‌و نووسین ف سواد.

**سەوادداو:** خوێندەوار ف باسواد.

**سەوادە:** سەڵتەزەلام ف پیادهٔ تنها.

**سەوال:** پاتاڵ، ئاژاڵ، گاوگۆل و مەڕ و ماڵات ف دام اهلی.

**سەواڵ:** سەوال ف دام اهلی.

**سەواڵە:** سواڵە ف نگا: سواڵە.

**سەوای:** سوزی، بەیانی ف فردا.

**سەوجە:** گوندێکە لەلای شنۆ ف نام دهی است.

**سەوچ:** شیان، ژێهاتن ف لیاقت.

**سەوچیان:** شیاوی، ژێهاتوویی ف شایستگی.

**سەوخان:** خافڵان، گوێنەدان بە ئەرك ف رها کردن وظیفه، غفلت.

**سەودا:** ۱) ئاڵوویر، داوستـەد؛ ۲) خولیا، ئیشتیا بە خەیاڵ؛ ۳) بیرۆی تەڕ، تەڕەبیرۆ؛ ۴) ئەڤین، دڵداری ف ۱) معامله، دادوستد؛ ۲) هوس؛ ۳) اکزما؛ ۴) عشق.

**سەودادار:** نەخۆشی تەڕەبیرۆ ف بیمار اکزما.

**سەوداسەر:** ۱) دینی ئەڤین؛ ۲) خەیاڵاوی و گێژوویژ ف ۱) والهٔ عشق؛ ۲) پردغدغه.

**سەوداگەر:** بازرگان ف تاجر.

**سەودایی:** ۱) نەخۆشی سەودا؛ ۲) ئەڤیندار، بەندەوار ف ۱) بیمار اکزما؛ ۲) عاشق واله.

**سەور:** ۱) سەبر، پشوو لەسەرخۆیی؛ ۲) بەنەرمی: (سەور قسەبکە)؛ ۳) سنێر، شیاکـە؛ ۴) ساو، سامـاڵ: (نـەی سەورێنی نەی غەورێنی / لەیلێ و مەجروم پێك گەیێنی) «بەیتی لەیلێ و مەجرون» ف ۱) شکیب؛ ۲) یواش، ئارام؛ ۳) سرگین؛ ۴) آسمان صاف.

**سەورگە:** سەرانوێلك ف سرگینگاه.

**سەورو:** ۱) سنێر، ریخ، شیاکە؛ ۲) زبڵ و زاڵ ف ۱) سرگین؛ ۲) آشغال.

**سەوری:** سموورە ف سمور.

**سەوز:** سەبز ف سبز.

**سەوزاو:** نەخۆشیەکی چاوە ف یکی از بیماریهای چشم.

**سەوزایی:** ۱) رەنـگـی سەوز؛ ۲) گیاسـەوزی دەشـتودەر ف ۱) سبزرنگی؛ ۲) سبزهٔ در و دشت.

**سەوزبون:** ۱) ڕوانی ڕوەك؛ ۲) بریتی لە لەنەكاو پەیدابوون؛ ۳) بریتی لە بەهرەدانی كار ف ۱) رستن نباتات؛ ۲) کنایه از یکهو پیدا شدن؛ ۳) بهره دادن کار.

**سەوزخـر:** پێش‌فرۆش کڕ، کەسێ کە پارە بە سەلـەم دەدا ف کسی محصول را پیش‌خرید می‌کند، سلف خر.

**سەوزفرۆش:** کەسێ کە پارەی سەلەم وەردەگرێ ف سلم‌فروش، کسی که محصول را پیش‌فروش کند.

**سەوزکردن:** ۱) ڕواندن، چاندن و شین بوون؛ ۲) بریتی لە پێك‌هێنانی کار ف ۱) رویانیدن؛ ۲) کنایه از انجام دادن کار.

**سەوزە:** ۱) شینایی دەشت و دەر؛ ۲) زەری، سپی ئاماڵ زەرد؛ ۳) جۆرێ مێوژ ف ۱) سبزه؛ ۲) آدم سبزینه رنگ؛ ۳) نوعی کشمش.

**سەوزەپۆش:** کێوێکە لە ناوچەی شاروێران ف نام کوهی است.

**سەوزەزار:** شوێنی پڕلە گیاشین: (شەوە لەم سەوزەزارە لەو دەم‌ئاوە / مەکۆی خەم لاچوە دەمکوڵ چماوە) «هەژار» ف سبزه‌زار.

**سەوزەکۆ:** کاسەڵەشینکە، مەلێکە هەموگیان کەسك ف پرندهٔ سبزه‌قبا.

**سەوزەڵان:** سەوزەزار ف سبزه‌زار.

**سەوزەڵانی:** سەوزەزار ف سبزه‌زار.

**سەوزەڵە:** جوانی سەوزەرەنگی تازە پێ گەیشتو ف زیبای نوجوان سبزه.

**سەوزەڵێ:** وشەی دواندنی سەوزەڵە ف کلمهٔ خطاب به زیبای سبزه‌رنگ.

**سەوزەوات:** ئەو گیایانەی دەخورێن بە کاڵی ف سبزیجات.

**سەوزی:** ۱) گیای دەستچێن بۆ خواردن؛ ۲) رەنگی کەسك؛ ۳) ناوی گوندێکە لە موکوریان ف ۱) سبزی خوردن؛ ۲) سبز رنگ؛ ۳) نام روستایی.

**سەوقات:** دیاری ف ارمغان.

**سەوقاتی:** ۱) شتێ کە بە دیاری ناردراوە؛ ۲) تریان، قەرتاڵەی میوە ف ۱) کادو، ارمغان، رەآورد؛ ۲) سبد میوه‌چینی.

**سەوك:** ستۆرك، کولێرە، نانی ئەستوری گروڤەر ف گردهٔ نان.

**سەوکامریا:** ستورکی بەخشینەوە بە خێری مردوو ف نانی که به یادبود مرده بخشند.

**سەوگر:** بولێڵەی بەیان، کازیوەی بەیانی ف کلّهٔ سحر.

**سەوگور:** سەوگر ف کلّهٔ سحر.

**سەوڵ:** ۱) گوڵی پۆپە کەڵەشێرە؛ ۲) داری سەرو، سەلو؛ ۳) سەڵپ ف ۱) گل تاج خروس؛ ۲) درخت سرو؛ ۳) پاروی قایقرانی.

**سەوڵك:** ئەستێوڵك ف آهنی که بر تنور دراز کنند.

**سەولە:** ئەستورکێ لە درشتەی ئارد کە خۆراکی سەگە ف نواله از نخاله برای غذای سگ.

**سەوە:** ۱) سەبەت، سەبەتە؛ ۲) گۆزە، جێ ئاوی لە سواڵەت ف ۱) سبد؛ ۲) سبو.

**سەوەتە:** سەبەت، سەبەتە، سەوە ف سبد.

**سەوەڕیخ:** سەبەتەی سنێرگوێزانەوە ف کلج، سبد پهن‌کشی.

**سەویك:** ۱) ئەستـورکی بەڕۆن؛ ۲) گۆزەی مل باریك، جەڕە ف ۱) گرده نان روغنی؛ ۲) سبوی گردن باریك.

**سەویل:** ۱) سەبیلەی تووتن‌کێشـان؛ ۲) گۆزەی مل‌باریك، جەڕە؛ ۳) ئاوی خێرێ ف ۱) چپق؛ ۲) سبوی گردن‌باریك؛ ۳) آب خیریّه.

**سەوێڵ:** سەواڵ ف نگا: سەواڵ.

**سەویلك:** گۆزەی مل‌باریك، جەڕە ف کوزهٔ با گردن بلند و باریك.

**سەویلە:** سەبیلە ف چپق.

**سەوین:** سەلەشیرك ف سبد جای ظرف.

**سەهـ :** سەح، ئاگاداری ف آگاهی.

**سەهان:** سنێر، سەرین، ریخ ف سرگین.

**سەهگور:** سەوگر ف کلّهٔ سحر.

**سەهەندە:** ۱) بزۆزو بێ‌ئارام؛ ۲) ئاژاوەچی؛ ۳) زرنگ؛ ۴) گوێ نەبیس، سەرسەخـت ف ۱) ناآرام؛ ۲) مفتـن؛ ۳) زرنگ؛ ۴) خـودرأی،

سەرسخت.

**سەهنگە:** سەهندە ف نگا: سەهندە.

**سەهو:** هەڵە، لەبیرچوون ف اشتباه، سهو.

**سەهۆڵ:** ئاوی لەسەرمان ڕەق هەڵاتوو، یەخ، سۆڵ، سۆڵە ف یخ.

**سەهۆڵان:** ۱) قوڵکەئاوێ کە سەهۆڵ دەبیەستێ؛ ۲) ناوی گوندێکە لە موکوریان ف ۱) یخچال طبیعی؛ ۲) نام روستایی.

**سەهۆڵاو:** ئاوی تێکەڵ بە سەهۆڵ ف آب یخ.

**سەهۆڵ بەنان:** بەستەڵەك ف یخبندان.

**سەهۆڵ بەندان:** بەستەڵەك ف یخبندان.

**سەهـۆڵخـانـە:** جێگـەیەك کە سەهۆڵی تێدا هەڵدەگرن بۆ هاوین ف یخچال مصنوعی.

**سەهۆڵدان:** سەهۆڵان ف یخچال.

**سەهویر:** تارمایی، ڕەشکەو پێشکە ف شَبَح.

**سەهەن:** ۱) سێبەری خەستی دار؛ ۲) سەحەنی نانخواردن ف ۱) سایهٔ پُر درخت؛ ۲) طبقچه.

**سەهەند:** ۱) سای خەستی دار؛ ۲) بریتی لە زۆر ساردو سەرما؛ ۳) ناوی زۆزانێکە ف ۱) سایهٔ پُر درخت؛ ۲) کنایه از سرمای شدید؛ ۳) نام ییلاقی.

**سەهەنگ:** سای خەستی دار ف سایهٔ غلیظ درخت.

**سەهەنـە:** ۱) سەهەنگ؛ ۲) سەهنـدە ف ۱) سایهٔ غلیـظ؛ ۲) نگا: سەهندە.

**سەی:** ۱) سەگ؛ ۲) ڕاو ف ۱) سگ؛ ۲) شکار.

**سەیاح:** دنیاگەڕ ف جهانگرد.

**سەیاحـــەت:** ۱) گەڕان بۆ کەیفو دڵـخـۆشی؛ ۲) دنیاگەڕی ف ۱) سیاحت، گردش تفریحی؛ ۲) جهانگردی.

**سەیارە:** دەستەی پێشەنگی لەشکر ف دستهٔ پیشاهنگ لشکر.

**سەیاف:** سەگاف ف سگلاب.

**سەی پسانك:** تووتکە سەگ ف تولەسگ.

**سەید:** لە تۆرەمەی پێغەمبەر ف سیّد.

**سەیدا:** فێرکار، دەرزبێژ، مامۆستا ف مدرّس، آموزگار.

**سەیداوا:** ناوی چەند گوندە ف نام چند روستا.

**سەید جێژنێ:** گونـدێکــە لە کوردستــان بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای خراب شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**سەیدحـەسـەن:** گونـدێکـە لە کوردستـان بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای خراب شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**سەیدك:** گیایەکە بەرێکی وەك نۆك دەگرێو بەشینی دەخورێ ف گیاهی است باثمر نخود مانند و خوردنی.

**سەیدمـراد:** ناوی گوندێکی کوردستان بو بەعسی وێرانیان کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان به دست بعثیان.

**سەیدمەحمود:** ناوی گوندێکی کوردستان بو بەعسی وێرانیان کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان به دست بعثیان.

**سەیدۆکە:** ۱) سەیدك؛ ۲) ناوی گوندێکی کوردستانە بەعسی وێرانیان کرد ف ۱) نگـا: سـەیدك؛ ۲) نام روستایی در کردستان خراب شده توسط بعثیان.

**سەیدۆکە:** سەیدك ف نگا: سەیدك.

**سەیدە:** ڕاو ف شکار.

**سەیدەمین:** ناوی گوندێکی کوردستان بو بەعسی وێرانیان کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان به دست بعثیان.

**سەیدەوان:** ڕاوچی ف شکارچی.

**سەیر:** ۱) سەمەرە، عەجایب؛ ۲) گەڕان لە دەشتو دەر؛ ۳) تماشا ف ۱) عجیب؛ ۲) گشت و گذار؛ ۳) تماشا.

**سەیرا:** گوڵێکە پشتی پەڵکی سوورەو ناوەوەی سەوزو ڕەشە ف گلی است.

**سەیرارا:** گوڵێکە، سەیرا ف گلی است.

**سەیران:** سەیاحەت ف سیاحت.

**سەیرانکەر:** کەسێ کە دەچێتە سەیاحەت ف سیّاح.

**سەیرانگا:** جێگەی سەیران لێ کردن ف تماشاگە، گردشگاه.

**سەیرکەر:** تواشاچی ف تماشاچی.

**سەیرە:** مەلێکی پچوکە ف پرندەای است.

**سەیزان:** نۆدەی ژێر زەمین ف اطاق زیر زمینی.

**سەیزادە:** ژنی سەید ف زن سیّدە.

**سەیس:** کوڕ، بەچکەبزنی نێری دوساڵە ف بزغالهٔ نر دوساله.

**سەیقان:** ۱) ڕاوکەر، نچیرڤان؛ ۲) کەپر، چەتر، سابات ف ۱) شکارچی؛ ۲) سایەبان.

**سەینوبەین:** کەینو بەین ف تبانی.

**سەیوان:** ۱) سابات؛ ۲) خەرمانەی مانگ ف ۱) سایەبان؛ ۲) هالە.

**سەیە:** سەگە ف نگا: سەگە.

**سی:** ۱) جەرگی سپی، ئەندامی هەناسەدان لەلەشدا؛ ۲) نەخۆشی دەردە باریکە؛ ۳) باڵدارێکی سپی کێوی، قولینگ؛ ۴) بیستو دە؛ ۵) سەبا، سەوا، لەبـــەر؛ ۶) ڕەش، سیا ف ۱) ریە؛ ۲) بیمـــاری سل؛ ۳) غاز وحشی؛ ۴) عدد سی؛ ۵) از برای، بخاطر؛ ۶) سیاه.

**سێ:** ۱) سا، سێبەر؛ ۲) یەك دەگەڵ دو ف ۱) سایە؛ ۲) عدد سە.

**سیا:** ڕەش، بەرانبەری سپی ف سیاه.

**سیابو:** گیایەکە دەکرێتە ناو ژاژی ف گیاهی کە با شیر از آمیزند.

**سیابەند:** ناوە بۆ پیاوان ف نامی مردانە.

**سیاتاڵە:** ۱) ڕەشتاڵە؛ ۲) بەدبەخت ف ۱) سیەچردە؛ ۲) سیەبخت.

**سیاتۆمە:** ڕەشتاڵە ف سیەچردە.

**سیاتۆوە:** ڕەشتاڵە ف سیەچردە.

**سیاچادر:** ڕەشماڵ ف سیاەچادر.

**سیاچارە:** بەخت ڕەش ف سیەبخت.

**سیاچردە:** ڕەشتاڵە ف سیەچردە.

**سیاچەمانە:** گۆرانیەکی بەناوبانگی هەورامانە ف آهنگی مشهور.

**سیاحەت:** سەیاحەت، سەیران ف سیاحت.

**سیار:** ۱) تاریکار؛ ۲) سوار؛ ۳) شاگرد، بەردەستی پیشەساز؛ ۴) نەخۆش بە دەردی سی؛ ۵) بڵندتر، سوار ف ۱) یار و یاور؛ ۲) سوار؛ ۳) شاگرد؛

۴) بیمار مسلول؛ ۵) بلندتر، مشرف.

**سیاڕۆ:** بەخت ڕەش ف سیەروز.

**سیارە:** ۱) سوارە، دەستەی سواران؛ ۲) بەسواری؛ ۳) جۆرێ گەنم؛ ۴) زیادەی سەری چوارچێوە کە دەچێتە ناو دیوار؛ ۵) ناوی گوندێکە ف ۱) دستۀ سوار؛ ۲) سوارە؛ ۳) نوعی گندم؛ ۴) زیادی چهارچوب که در دیوار فرو می‌رود؛ ۵) نام دهی.

**سیازاخ:** ۱) جۆرێ زاخی ڕەشە؛ ۲) گیایەکە کەم‌تەمەن ف ۱) زاج سیاه؛ ۲) گیاهی است.

**سیازدەمین:** دوای دوانزەهەم ف سیزدهم.

**سیازدەمین:** دوای دوانزەهەم ف سیزدهم.

**سیازدەهەمین:** سیازدەمین ف سیزدهم.

**سیازوخاڵ:** برێتی لە ڕەشی زۆر ڕەش ف کنایه از بسیار سیاه.

**سیازەندۆق:** مرۆی زۆر لاوازی ڕەش هەڵگەڕاو ف لاغرمردنی سیه‌فام.

**سیاساڵ:** وشکەساڵ، ساڵی بێ‌باران: (لە چاوا نم نەما بۆ گریە نوورەی سەجدە بەر دەریە / **سیاساڵم** نەبارە نوێژی ئیستیسقا نەکەم چبکەم؟) «مەحوی» ف خشکسال.

**سیاماڵ:** ڕەشماڵ ف سیاه‌چادر.

**سیامەرو:** گوندێکی کوردستانی وێرانەی دەستی بەعسی‌یە ف روستایی ویران شده توسط بعثیان.

**سیامەند:** ناوی پیاوانە: (بەیتی خەجێ و سیامەندت بیستوە؟) ف نامی مردانه.

**سیامەنسور:** گوندێکی کوردستان بو بەعسی کاولیان کرد ف از روستاهای خراب شدۀ دست بعثیان.

**سیان:** ۱) دوکەڵی لەدیوار و دەفر نیشتو، قورم، دووده؛ ۲) ژمارە سێ ف ۱) دوده؛ ۲) عدد سه.

**سیانزە:** سیازدە ف سیزده.

**سیانزەمین:** سیازدەمین ف سیزدهم.

**سیانزەهەم:** سیانزەمین ف سیزدهم.

**سیانزەهەمین:** سیانزەمین ف سیزدهم.

**سیانکە:** قوڕ و لیتە ف گل‌ولای.

**سیانە:** سێ پێکەوە: (ئەم بزنە **سیانەی** دیوە) ف سه‌تایی، سه‌قلو.

**سیانهۆ:** گیایەکە ف گیاهی است.

**سیاو:** سیا، ڕەش ف سیاه.

**سیاوا:** ڕەشەبا ف باد غربی.

**سیاوپوزە:** گیایەکە لەناودا دەڕوێ ف گیاهی است آبزی.

**سیاوسەدە:** گوڵی سمڵ ف سنبل.

**سیاوڵە:** ڕەشکە، تۆمێکی ڕەشە بەنانی‌دا دەکەن ف سیاه‌دانه.

**سیاون:** ۱) ڕەشانگ، بزنەمو؛ ۲) گۆشتی بزنەمو؛ ۳) چەورێ کە بەناودەمەوە بنوسێ ف ۱) بز مو یین؛ ۲) گوشت بز مو یین؛ ۳) چربی که به‌کام چسبد.

**سیاونە:** سیاون ف نگا: سیاون.

**سیاوە:** ڕەش ف سیاه.

**سیاهە:** نوسینی حیساب و ناو لە قاقەز، لیستە ف لیست، سیاهه.

**سیاهی:** سیاهە ف لیست، سیاهه.

**سیایی:** سیاهە ف لیست، سیاهه.

**سێبارە:** سێ جار پاتەکردنەوە ف تکرار برای سومین بار.

**سێبارەپات:** سێبارە ف نگا: سێبارە.

**سێباز:** گەمەیەکە بازی گەورەی تیا ئەدەن ف ورزش پرش.

**سێبازد:** سێباز ف ورزش پرش.

**سێبزەمینی:** پەتاتە، پارەلماسی ف سیب‌زمینی.

**سێبست:** ۱) سێ پایەی ئاگردان؛ ۲) برێتی لە مرۆی کورتەباڵا ف ۱) سه‌پایۀ اجاق؛ ۲) کنایه از کوتاه قد.

**سێبسکۆك:** گێلاخە، گیایەکە دەگەڵ شێو دەکرێ ف گیاهی است با آش می‌پزند.

**سێبسکە:** سێبسکۆك ف نگا: سێبسکۆك.

**سێبن‌هەرد:** سێوەبن عەرزیلە ف سیب‌زمینی ترشی.

**سێبەر:** ۱) سایە، سا؛ ۲) برێتی لە سێ تەڵاقەی ژن ف ۱) سایه؛ ۲) کنایه از سه طلاق.

**سێبەردە:** برێتی لە سێ تەڵاقە ف کنایه از سه طلاق.

**سێبەرك:** سێبەردە ف نگا: سێبەردە.

**سێبەڕۆ:** نۆبەتێ کە سێ ڕۆژە بە ف تب‌نو به سه‌در میان.

**سێبەسێ:** هەرسێك پێکەوە ف هرسه با هم.

**سێبەگایە:** گای سێهەم بۆ نۆرەپێ کردن لە کێڵانی زەوی‌دا ف گاو یدکی برای شخم.

**سێبەلەك:** گیایەکە ئاژەڵ زۆر حەزی لێ‌دەکا، سێوەرە ف نوعی علوفه.

**سێبەند:** گای شەش‌ساڵە ف گاو شش ساله.

**سێبەندە:** نێوان جوچکەی سمت و کەمبەر ف میان باسن و مهرۀ فقرات.

**سێبەندی:** بێ‌حەیاو شەرم ف بی‌شرم وآبرو.

**سێبەنگی:** ڕەشی دڵپەسندو جوان بۆ چاوو برۆی دەڵێن ف مشکی دلربا که برای چشم و ابرو گویند.

**سێبەنە:** سێ ئەوەندە، سێ قات ف سه‌برابر.

**سیپ:** ۱) دەستەندو؛ ۲) تابشتی زۆر؛ ۳) تامان لە چەم بۆ ماسی‌گرتن؛ ۴) ڕەبەت، سیپە ف ۱) دستگیرۀ خیش؛ ۲) نیروی زیاد؛ ۳) دیوار از ترکه در رود برای صید ماهی؛ ۴) کمینگاه شکارچی.

**سێپ:** ۱) دەستەندو؛ ۲) کونی سێرەی تفەنگ ف ۱) دستگیرۀ خیش؛ ۲) سوراخ مگسك تفنگ.

**سێپا:** ۱) سێبست، سێ‌پایەی ئاگردان؛ ۲) جۆرێ هەڵپەرکێ؛ ۳) سێ‌پایەی مەشکە ف ۱) سه‌پایۀ اجاق؛ ۲) نوعی رقص گروهی؛ ۳) سه‌پایۀ مشك.

**سیپارە:** پاژێ لە سی‌پاژی قورعان بە توسراوی ف یك جزء از سی جزء قرآن.

**سیپاڵ:** ۱) جلك، بەرگ و کەل و پەلی مرۆ؛ ۲) کۆنەپەڕۆ، پەڕۆی دڕاو؛ ۳)

بەڕەی ساکارو کەمبەر ف ۱) لباس؛ ۲) پارچۀ کهنه، کهنەپاره؛ ۳) گلیم ساده و کم عرض.

**سیپاڵ بەڕۆن:** هەویری دەناورۆن و دۆشاودا سوورەوەکراو ف خمیر در شیره و روغن سرخ شده، چنگاله.

**سیپاڵ بە کۆڵ:** بریتی لە دۆڵمەی پەلکەمێو ف کنایه از دلمۀ برگ مو.

**سێپالو:** تاشراوی سێ سووچ ف سەپهلو.

**سیپان:** ۱) بلندایی باگێڕەوە؛ ۲) ناوی دوچیایە لە کوردستان؛ ۳) کێوی پڕ لە بەفر لە هەمو دەماندا؛ ۴) ژنی کلێلە، شاپە ف ۱) بلندی مانع باد؛ ۲) نام دو کوه در کردستان؛ ۳) کوهی که در همۀ ایام برف داشته باشد؛ ۴) نگا: رنی.

**سێپایە:** سێپای ئاگردان ف سەپایۀ اجاق.

**سێ پریسك:** پەرەسێلکە ف پرستو.

**سیپك:** ۱) سێ پای مەشکە؛ ۲) سێ پایەی ئاگردان ف ۱) سەپایۀ مشك؛ ۲) سەپایۀ اجاق.

**سیبکان:** هۆزێکی کوردە ف عشیرتی است کردزبان.

**سێپل:** رچەی بەکۆمەڵی کورکوڕو کەو ف دستۀ انبوه با قرقره و کبك.

**سیپو:** پۆپەڕەشە ف طاعون مرغ.

**سیپە:** ۱) ڕەبەت، بۆسەی ڕاوکەر؛ ۲) سێرەی تفەنگ ف ۱) کمین شکارچی؛ ۲) مگسۀ تفنگ.

**سێپەڕە:** گیایەکە سێ بەرگ لەوەڕێکی زۆر خۆشە ف گیاهی است.

**سێپەك:** سێپایەی مەشکە ف سەپایۀ مشك.

**سیپە کوڕ:** جۆرێ تفەنگ کە سێرەی پشت چەماوەیە ف نوعی تفنگ.

**سیپەل:** پێل، شەپۆل ف موج.

**سیپەلاك:** جەرگی سپی، سی ف ریه، شش.

**سێپەلاك:** سیپەلاك ف ریه، شش.

**سیپەلك:** سێپەلاك ف ریه، شش.

**سیپەلۆك:** زاروی نێوان حەوت تا نۆساڵانە ف کودك هفت تا نُه ساله.

**سێ پێ:** ۱) جۆرێ رەقس؛ ۲) سێپا ف ۱) نوعی رقص؛ ۲) سەپایه.

**سێ پێ یی:** جۆرێ رەقس، سێ پێ ف نوعی رقص گروهی.

**سیت:** ۱) تەپکە؛ ۲) بریتی لە شەرمی ژن؛ ۳) لەقەمە بۆ ژنان ف ۱) نوعی دام برای شکار پرنده؛ ۲) کنایه از شرمگاه زن؛ ۳) لقبی برای زنان.

**سێتا:** گشتەکی سێ باد، سێ داوی پێکەوە بادراو ف ریسمان سه باد.

**سێتاف:** ۱) سایەی مرۆ لەبەر خۆر؛ ۲) تارمایی ف ۱) سایۀ انسان در آفتاب؛ ۲) شبح.

**سیتافك:** ۱) سێتاف؛ ۲) تافگە ف ۱) سایۀ انسان در آفتاب؛ ۲) آبشار.

**سیتبلۆق:** ژنی ئیشتیالەگان، حەشەری ف زن شهوانی.

**سیتك:** بەردەلان و تم‌تمان ف سنگلاخ سخت.

**سیتکەزەلام:** باپشکێو، چینچکە سلاو ف گل‌مژه.

**سیتکەسلاو:** سیتکەزەلام ف گل‌مژه.

**سیتکەسلاوە:** سیتکەزەلام ف گل‌مژه.

**سیتکەسەلام:** سیتکەزەلام ف گل‌مژه.

**سیتل:** ۱) مەنجەڵ، بەرۆش؛ ۲) سەتڵ ف ۱) دیگ مسی؛ ۲) سطل.

**سیتلی سماق:** پیازی سماق لێدراو ف پیاز سماق‌زده.

**سیتە:** تەپکە ف دامی که بر تخته کوبند.

**سێتە:** ۱) چیا، کێو؛ ۲) پۆ؛ ۳) سێتا ف ۱) کوه؛ ۲) پود؛ ۳) رسن سه‌باد.

**سێتەپان:** گوندێکی کوردستانە بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران کردستان توسط بعثیان.

**سیتەك:** ۱) بەردەلان؛ ۲) ناوی گوندێکە ف ۱) سنگلاخ؛ ۲) نام دهی.

**سێ تەنگە:** بریتی لە ورگ‌زل ف کنایه از شکم گنده.

**سێ جرتە:** سێ جرتەکی ف نگا: سێ جرتەکی.

**سێ جرتەکی:** سەماکردنی بەرهەڵداو تونـد خۆحەوادان ف رقص بی‌قانون و شدید.

**سێ جرتی:** سێ جرتەکی ف نگا: سێ جرتەکی.

**سێجگە:** جۆرێ قاپێن، جگێن ف نوعی بازی با شتالنگ.

**سیچقە:** پەنەمانی بن موی لەش لەسەرمان ف برآمدگی ریشۀ مو از سرما.

**سیچقە دەرکردن:** موی لەش لەسەرمان راست بوونەوە ف موی بر تن سیخ شدن از سرما.

**سیچك:** جۆرێ بەری دارمازو ف بزغند، نوعی ثمر مازوج.

**سیچکە:** ۱) سیچك؛ ۲) خونچەی تازەی دار، پۆخ ف ۱) نگا. سیچك؛ ۲) اوّلین غنچۀ درخت.

**سیچکەسلاو:** باپشکێو ف گل‌مژه.

**سیچکەسلاوە:** باپشکێو ف گل‌مژه.

**سێچوار:** دوازدەرۆژی سەرەبەهار ف دوازده روز اوّل بهار.

**سێ چوکڵ:** پەیکوڵ، دڕکێکە سێ سووچ ف خارسه‌کوهه.

**سێ چوکڵە:** ۱) سێ سووچ، سێ گۆشـە؛ ۲) سێ ددانـە: (پیتی سین سێ چوکڵەیە) ف ۱) سه‌گوش، مثلث؛ ۲) سه‌دندانه.

**سی چە:** بۆچی، لەبەرچی ف چرا.

**سیچەسلاوە:** باپشکێو ف گل‌مژه.

**سیچی:** گوندێکی وێرانی کوردستان بەدەستی بەعس ف از روستاهای خراب شدۀ کردستان توسط بعثیان.

**سێ حاچە:** ۱) سێ فلیقانە؛ ۲) لە سێ لاوە تاشراو ف ۱) سه‌شاخه؛ ۲) سه‌پهلو.

**سیحر:** جادوو ف سحر.

**سیحر باز:** جادووگەر ف ساحر، جادوگر.

**سیخ:** ۱) زەرگ؛ ۲) راست، نەخوار؛ ۳) خویز، خووسار، زوقم ف ۱) سیخ درویشان؛ ۲) راست ایستاده؛ ۳) پژ، سرماریزه.

**سیخاخن:** بە زەبری شیش پڕکران، توند ئاخندران ف بافشار آگندن.

**سیخار:** زوقم، خووسار، خویز، ئاڵشت، خووس ف سرماریزه، پژ.

**سیخاندن:** بەزۆر تێ ڕاکردن ف فرو کردن.

**سیخ پەڕ:** جوچکەمەلی تازە پەڕدەرکردو ف جوجۀ تازه پردرآورده.

**سیخ چوڵە:** جۆرێ ژیشکی زەلام ف سیخول، خارپشت درشت.

**سیخ دان:** دنەدان، هانەدان ف تحریك.

**سیخْك:** توڵی سەردادراو بۆ چەقاندن، قەڵەمە ف قلمه.

**سیخن:** لاواز، لەجەر، داڵگۆشتی بێهێز ف لاغر مردنی.

**سیخناخ:** سیخاخن ف نگا: سیخاخن.

**سیخنە:** لاوازی کورتەباڵای پوتەکە ف لاغرمردنی.

**سیخور:** ۱) سیخ چوڵە؛ ۲) پەڵخور؛ ۲) جاسوس ف ۱) سیخول؛ ۲) کاه بلعیده شدهٔ هضم نشده؛ ۳) جاسوس.

**سیخورمە:** ۱) بە مشت لێدان؛ ۲) دنەوهانەدان؛ ۳) دار تێ ژەنین ف ۱) با مشت زدن؛ ۲) تشجیع؛ ۳) چوب فروکردن.

**سێدارە:** داری مرۆپێ خنکاندن، قەنارە ف دار اعدام.

**سێدانـــە:** ۱) سێ جەم لەوەڕی ئاژەڵ؛ ۲) پەیکـوڵ ف ۱) سەوعـدە خوراك دام؛ ۲) خار سەکوهە.

**سێددان:** پەیکوڵ ف سەکوهە، خار.

**سیدە:** گوندێکی کوردستانە بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**سێدەری:** ژووری سێ پەنجەرە ف اتاق سه پنجره.

**سیدەکان:** گوندێکی کورستان بو بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**سێدەندك:** شەنەی سێحاچە ف افشون سەشاخه.

**سیر:** گیایەکی بۆن گرانی دەرمانە ف سیر گیاه مشهور.

**سێر:** تێر، مڕ ف سیر، مقابل گرسنه.

**سیراج:** خواردنێکە لە دۆی کوڵاو دەس دەکەوێ، شیرێژ، شیراز، ژاژی ف کتخ، شیراز، آنچه از دوغ جوشانده بدست آید.

**سیرئەنجن:** برێتی لە وردورد کراو ف ریز ریز شده.

**سیرپڤك:** سیره کێویلە ف سیرکوهی.

**سێرت:** ۱) دڕك؛ ۲) مەڵبەندێکە لە کوردستان ف ۱) خار؛ ۲) منطقه‌ای در کردستان.

**سیرتێدان:** بزاوتن، هەڵخڕاندن ف تحریك کردن.

**سیرجە:** نەخوشیەکی یەکسمە پێ دەمرێ ف از بیماریهای مُهلك دام.

**سیردان:** سیر تێدان ف تحریك کردن.

**سیردم:** سیرمۆك، گیایەکە ڕەگەڵ پەنیر دەخرێ ف گیاهی است.

**سیرْك:** سیره کێویلە ف سیر کوهی.

**سێرك:** سێ‌ڕۆژۆی یەزیدیەکان ف سەروز روزهٔ یزیدیان.

**سیرکامارا:** گیایەکی بۆن ناخۆشە ف گیاهی است بدبو.

**سیرکۆ:** دینگی چەڵتوك کوتان ف دنگ شالی کوبی.

**سیرم:** باریکەیەك لە چەرم ف نوار چرمی.

**سیرمۆك:** سیرەکێویلە ف سیر کوهی.

**سیرمۆکە:** سیرمۆك ف سیر کوهی.

**سیرمە:** سیرم ف نوار چرمی.

**سیرمەخۆر:** دزی خوێڕیلە ف دلەدزد.

**سێڕمەکی:** سێ جرتەکی ف نگا: سێ‌جرتەکی.

**سیرمەکێش:** ئامرازێ کە کڵاشدروو دەکاری دەکەن ف ابزاری در گیوه‌سازی.

**سێروو:** ڕەشۆڵە، ڕیشۆڵە، گاوانی ف سار.

**سێڕۆ:** تای سێبەڕۆ ف حالت تب تب نوبهٔ سه درمیان.

**سیروان:** ناوی چۆمێکە لە کوردستان ف نام رودخانه‌ای در کردستان.

**سێرۆچکە:** سوورانچك ف سرخنای، خرخره.

**سێڕۆژانـــە:** بەزم لە ماڵی زاوا دوای سێ ڕۆژ لە بووك گوێزانەوە ف سور روز سوم عروسی در خانهٔ داماد.

**سێڕۆژگانە:** هەڵوای مردو دوای سێ ڕۆژ ف حلوای روز سوم مرده.

**سێڕۆژە:** سێ‌ڕۆژگانە ف نگا: سێ‌ڕۆژگانە.

**سیرۆم:** چەرمی مێشنی تەنك ف چرم میشن نازك.

**سیرە:** ۱) دەنگی وەك دەنگی بەدەست شکاندنی کەلەم؛ ۲) وشەیەکە بۆ دەرکردنی مێشە نگوینی دەڵێن؛ ۳) دەنگی کەو لەترسان؛ ۴) زیرە ف ۱) صدای شکـافتن کلم، صدای فشردن برف زیر پا؛ ۲) اصطلاحی برای راندن زنبور عسل؛ ۳) صدای کبك از ترس؛ ۴) جیغ.

**سێرە:** ۱) قوتەی سەر لوولەی تفەنگ؛ ۲) ماوەی ژیان، زیندی سەر؛ ۳) سەیرە ف ۱) مگسهٔ تفنگ؛ ۲) مدّت زمان زندگانی؛ ۳) پرنده‌ای است کوچك.

**سیرەت:** کێری منال ف آلت تناسلی پسر بچّه.

**سیرەج:** ڕۆن کنجی ف روغن کنجد.

**سیرەسیر:** ۱) دەنگی شکـانـدنی کەلـەم؛ ۲) زیرەزیر؛ ۳) دەنگی کەو لەترساندا ف ۱) صدای شکافتن کلم؛ ۲) جیغ و داد؛ ۳) صدای کبك ترسیده.

**سیرەکۆ:** ماڵەی قوڕ لە بەرد ف مالهٔ گل از سنگ.

**سیرەمۆزە:** سوورە مۆزە، جۆرێ مۆز کە بە ڕەشەوڵاخەوە دەدا ف موسهٔ قرمز.

**سیرەمۆکە:** سیرەکێویلە ف سیر کوهی.

**سیرەنجن:** سیرئەنجن ف ریزریز شده.

**سێڕیان:** سەری سێ ڕێگە کە دەگەنە یەك ف سەراهی.

**سێڕیزکانێ:** گەمەیەکە هەریەکە سێ بەردی پچووك دادەکەن، وەك دامە وایە ف نوعی بازی با شن، دوزبازی.

**سێ‌ریزکێن:** سێ‌ڕیزکانێ ف دوزبازی.

**سیرێژ:** ۱) جۆرێ چێشتە؛ ۲) سیراج ف ۱) نوعی آش؛ ۲) کتخ، کشك.

**سێزدە:** سیازدە ف سیزده.

**سێزدەمین:** سیازدەمین ف سیزدهم.

**سێزدەهەم:** سیازدەمین ف سیزدهم.

**سێزدەهەمین:** سیازدەمین ف سیزدهم.

**سێزن:** شەنە، شەن ف افشون.

**سێزو:** سبەی، سبحەی، سۆزی ف فردا.

**سیزواڵ:** سوورەسـاقـە، سوورە سەقـەتـە، خەیاتـە، زەرنەقووتە ف جوجه گنجشك پر در نیاورده.

**سیزە:** دەرزی ف سوزن.

**سێزە:** سێزدە ف سیزده.

**سیزی:** دەرزی ف سوزن.

**سیس:** ۱) ژاکاو؛ ۲) موُخورمایی؛ ۳) زاخه، کوُل؛ ۴) مێشێکه له هه‌نگ ده‌گا؛ ۵) فره‌چه‌رمگ، زۆرسپی [ف] ۱) پژمرده؛ ۲) موخرمایی؛ ۳) زاغ؛ ۴) مگسی شبیه زنبور؛ ۵) بسیار سفید.

**سیسا:** جۆرێ تۆمی گه‌نم [ف] نوعی گندم.

**سیسارك:** مه‌لێکی مردارخۆره [ف] کرکس.

**سیسارکه‌که‌چه‌ڵه:** سیسارك [ف] کرکس.

**سیسارگ:** سیسارك [ف] کرکس.

**سیسارگه‌که‌چه‌ڵه:** سیسارك [ف] کرکس.

**سیساڵه‌ك:** سیسارك [ف] کرکس.

**سیسان:** به‌یانی روُن، شه‌وه‌کی [ف] فجر صادق.

**سیس بوُن:** ژاکان [ف] پژمرده شده.

**سیس په‌ست:** برێتی له نه‌مانی هێزی گان کردن [ف] کنایه از زوال قوّهٔ باه، از دست دادن نیروی جماع.

**سیسرك:** سفره‌بڕه [ف] جیرجیرك.

**سیسره:** جانه‌وه‌رێکه له تیره‌ی کلوُ ره‌شه هه‌میشه له مه‌زرایه زیره‌ی دێ [ف] چرخ ریسك، نوعی جیرجیرك.

**سیس عه‌مه‌ر:** سوُسه نبه‌ر [ف] سوسنبر.

**سیس عه‌نبه‌ر:** سوُسه‌نبه‌ر [ف] سوسنبر.

سیسکه: جۆرێ مار [ف] نوعی مار.

**سیسوّ:** ۱) حیندرحوّ؛ ۲) موُزه‌رد [ف] ۱) آلاکلنگ؛ ۲) زردمو ی.

**سێ‌سو:** ۱) گیایه‌کی ره‌قه له زه‌لکاو ده‌ڕوێ سێ سوُچی هه‌یه؛ ۲) بڕ به‌ند [ف] ۱) گیاهی بلند و سه‌گوشه که در باتلاق می‌روید؛ ۲) سوهان.

**سێسوُچ:** سێ چوکڵه، سێ قولینچك [ف] سه‌گوش، مثلّث.

**سیسوّك:** سیسره [ف] جیرجیرك.

**سیسوّڵه:** داڵگوّشتی زه‌رده‌ڵه‌ی له‌جه‌ر [ف] لاغر پژولیده.

**سێسه‌ر:** یه‌ك به‌سێ، سه‌رێك ترێ به سێ‌سه‌ر گه‌نم [ف] معاوضهٔ یك به سه.

**سێسه‌ری:** گیایه‌که له‌ناو گه‌نما شین ده‌بێ [ف] گیاهی است که بیشتر در مزارع گندم روید.

**سیسه‌ڵه:** سیسوّڵه [ف] لاغر پژولیده.

**سیســه‌مـار:** ۱) سیسکـه؛ ۲) برێتی له مروّی ده‌بنـه‌وه‌بـڕ [ف] ۱) نگا: سیسکه؛ ۲) کنایه از آدم تودار.

**سیسه‌ن:** سوّسن، سوێسنه [ف] سوسن.

**سیسه‌نبه‌ر:** سوسه‌نبه‌ر [ف] سوسنبر.

**سیسی:** ۱) پەراسو؛ ۲) ژاکاوی؛ ۳) دانوّکه‌که‌نگر؛ ۴) وشه‌ی دنه‌دانی گوّڵه سه‌گ بوّ سواری دێڵ بوُن [ف] ۱) دندهٔ پشت؛ ۲) پژمردگی؛ ۳) کنگردانه؛ ۴) کلمهٔ تحریك سگ نر برای جفتگیری.

**سیسێ:** ژنی قژزه‌رد [ف] زن مو طلایی.

**سیسیان:** سیس بوُن [ف] پژمریدن.

**سێ‌سیخه:** ۱) سێ‌چوکڵه؛ ۲) سێ‌لکه؛ ۳) سێ‌پاڵو، داری له سێ‌لاوه تاشراو [ف] ۱) سه‌گوشه؛ ۲) سه‌شاخه؛ ۳) چوب سه‌پهلو تراشیده.

**سێ‌شه‌ش:** هه‌ژده روّژ له خاکه لێوه [ف] هیجده روز از فروردین ماه.

**سێ‌شه‌م:** چوارەم روّژی حه‌وته [ف] سه‌شنبه.

**سێ‌شه‌مب:** سێ‌شه‌م [ف] سه‌شنبه.

**سێ‌شه‌مبو:** سێ‌شه‌م [ف] سه‌شنبه.

**سێ‌شه‌مبوّ:** سێ‌شه‌م [ف] سه‌شنبه.

**سێ‌شه‌مبی:** سێ‌شه‌م [ف] سه‌شنبه.

**سێ‌شه‌موّ:** سێ‌شه‌م [ف] سه‌شنبه.

**سێ‌شه‌مه‌:** سێ‌شه‌م [ف] سه‌شنبه.

**سێ‌شه‌موّ:** سێ‌شه‌م [ف] سه‌شنبه.

**سێ‌شه‌مه:** سێ‌شه‌م [ف] سه‌شنبه.

**سێ‌شه‌می:** سێ‌شه‌م [ف] سه‌شنبه.

**سیعر:** جادو، سیحر [ف] سحر، جادو.

**سیغار:** جگه‌ره، جغاره [ف] سیگار.

**سێڤ:** میوه‌ی خوّشی به‌ناوبانگ [ف] سیب.

**سیڤا:** دامان و بیر کردنه‌وه [ف] تأمّل و تفکّر.

**سێڤتوّ:** بوّگه‌ن، بوّن ناخوّش [ف] بدبو.

**سێڤ زه‌مینه:** به‌تاته، بتێته، بوتێته، که‌رتوّفل، یاره‌ڵماسی [ف] سیب زمینی.

**سیڤوّکه:** گیایه‌که له کونجی ده‌کا [ف] گیاهی شبیه کنجد.

**سێڤه زه‌مینه:** سێڤ زه‌مینه [ف] سیب زمینی.

**سێڤه‌زه‌وینه:** سێڤ زه‌مینه [ف] سیب زمینی.

**سێڤـه‌ڵوُکه:** گیایه‌که به‌رێکی وردی خڕی سپی ده‌گرێ و ده‌خورێ [ف] گیاهی است که ثمر گرد و سفید و کوچك دارد و خوردنی است.

**سیڤه‌یییه‌ی کاکه‌یی:** گوندێکی کوردستانه به‌عسی وێرانی کرد [ف] از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**سێڤ:** سێڤ [ف] سیب.

**سیڤاسوّتك:** زیپکه‌یه‌که زوّر به‌ژان و دیاریش نیه [ف] جوشی است دردناك که ناپیداست.

**سیڤان:** چه‌تری به‌رخوّر [ف] چتر تابستانی.

**سیڤاندوّك:** پاساری، چێشکه، چوّله‌که، چویك [ف] گنجشك.

**سیڤاندوّکه:** سیڤاندوّك [ف] گنجشك.

**سێڤانده:** پاساره، سوانده، سوانه [ف] لبهٔبام.

**سیڤاندیلکه:** سیڤاندوّك [ف] گنجشك.

**سێڤ سیڤوّك:** پیازه خوُگانه [ف] پیازدشتی.

**سێڤله:** جرج، مشکه‌کوێره [ف] موش صحرایی.

**سیڤوّی:** سه‌ر بێژنگ [ف] نخاله.

**سیڤه:** پڕ گوّشت، قه‌ڵه‌و [ف] چاق.

**سیڤه‌روّك:** په‌تاته [ف] سیب زمینی.

**سیق:** دانی خوراوی هه‌زم نه‌کراوی ناوزگی مه‌ل؛ ۲) ده‌نگی شه‌مشێر له کالان ده‌رکێشـان؛ ۳) ورگ، مه‌عده [ف] ۱) مواد داخل چینه‌دان؛ ۲) صدای آختن شمشیر از نیام؛ ۳) معده.

**سیقاف:** حه‌نه‌کچی، قسه‌خوّش [ف] بذله‌گو.

**سیقاڵ:** مشت و ماڵ، ساف ولوُس کردنی کانزا [ف] صیقل فلز.

**سیقل:** جیکڵ، سیق، چینه‌ی هه‌زم‌نه‌کراو [ف] چینهٔ هضم نشده.

**سیقلدان:** جیکڵدان ف چینه‌دان.

**سیقلدانك:** جیکڵدان ف چینه‌دان.

**سیقلدانه:** جیکڵدان ف چینه‌دان.

سیقه: سیق ف نگا: سیق.

**سیقه‌تۆره:** کوڵه‌زرگ، جیکڵدانه ف سنگدان.

**سیك:** ۱) سوُچ، گۆشـه؛ ۲) تس، بای بێده‌نگی قنگ؛ ۳) سیق ف ۱) زاویه، گوشه؛ ۲) چُس؛ ۳) نگا: سیق.

**سێك:** سرکه ف سرکه.

**سیکار:** چه‌قۆ، کێرد ف کارد.

**سیکارد:** ته‌ور ف تَبَر.

**سێ کانیان:** ناوی گوندێکه ف نام دهی است.

**سیکك:** سێبه‌ر، سا، سیوّه‌ر ف سایه.

**سێ کوچك:** سێ به‌ردی ئاگردان ف سه‌سنگ اجاق.

**سێ کوچکه:** سێ کوچك ف سه سنگ اجاق.

**سی کوچکێن:** گه‌مه‌یه‌که سێ زارۆ ده‌یکه‌ن ف نوعی بازی سه نفرهٔ کودکانه.

**سێ کۆچه:** سێ سوُچ، سێ گوشه ف مثلّث.

**سێ کوُزه:** گیایه‌که له‌ئاوا ده‌بێ ف گیاهی است که در مرداب روید.

**سیکه‌تۆره:** کوڵه‌زرگ، سیقه‌تۆره ف سنگ‌دان مرغ.

**سێ که‌ڤر:** سێ به‌رده، بریتی له ژن ته‌ڵاقدان ف کنایه از طلاق دادن زن.

**سێ که‌هر:** بزنێ سێ کاریله‌ی به‌زگێك ببێ ف بُزی که از یك بار زاییدن سه بُزغاله بیاورد.

سێ گا: ناوی مه‌قامێکه ف دستگاه سه‌گاه در موسیقی.

**سیگار:** جگه‌ره، جغاره، سیغار ف سیگار.

**سێ گاسنه:** ونار، شیوی سێ‌جار کێڵدراو ف زمین سه‌بار شخم شده.

**سێ گاف:** گه‌مه‌ی که‌وشه‌ك، سێ‌باز ف بازی سه‌گام.

**سێ گرکـان:** ناوی گونـدێکه له کوردستان به‌عسی وێرانیان کرد ف از روستاهای خراب شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**سێ گره:** ناوی گونـــدێکـــه له کوردستـان به‌عسی وێرانیان کرد ف از روستاهای خراب شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**سێ گۆشه:** سێ‌سوُچ ف سه‌گوشه.

**سێگۆه:** شه‌نی سێ حاچه ف افشون سه‌شاخه.

**سیل:** ۱) پلوُسـك، لوُسـاوك؛ ۲) نه‌خـۆشی دیق؛ ۳) سیقاڵ؛ ۴) سپی کردنـــه‌وه‌ی مس؛ ۵) ئه‌ستێل ف ۱) ناودان؛ ۲) بیمـــاری سلّ؛ ۳) صیقل؛ ۴) سفیدگری ظرف مسین؛ ۵) استخر کوچك.

**سێل:** ۱) ساج؛ ۲) تواشا، سه‌یر ف ۱) ساج؛ ۲) نگاه، تماشا.

**سیڵ:** ساج ف ساج، تابه.

**سیلا:** کون، قول ف سوراخ.

**سیلاخ:** ۱) سیلا؛ ۲) شوێنێ که ره‌ڵمی زۆر لێ‌یه ف ۱) سوراخ؛ ۲) ریگزار.

**سێلاخ:** ره‌ڵمێ که ئاو ڕای داوه‌و داویه‌ته ره‌خی روبار ف ماسهٔ سیل آورده.

**سیلامیش:** کونه مشك، قوله مشك ف سوراخ موش.

**سیلان:** مورگێکی ره‌شه بۆ خشڵی ژنان ده‌بێ ف از سنگهای زینتی زنانه.

**سێڵاو:** لافـــاو، له‌هـی، لی، ئاوی زۆر به ته‌وژم که باش باران دێت ف سیلاب، سیل.

سێڵاوگر: شیوو که‌ندی که لافاوی پێ‌دا دێت ف مسیر سیل.

**سیلاوی:** نه‌خۆشی سیل و دیق ف بیمار مسلول.

**سێڵخان:** لیته‌و قوڕی ناو جۆگه ف لای و لجن جویبار.

**سیلك:** ۱) خیزی چۆمان؛ ۲) ره‌مڵ ف ۱) شن رودخانه؛ ۲) ریگ.

**سێلك:** شه‌نی سێ‌ددانه ف چچ، سه‌شاخهٔ کشاورزی.

**سیل کردن:** سیقاڵ دان ف صیقل دادن.

**سیل کۆیی:** گونـدێکـی کوردستـــانـــه به‌عسی ویرانیان کرد ف از روستاهایی است که بعثیان ویران کردند.

**سیلکه:** نێره‌که‌ری ره‌سه‌ن بۆ خستنه‌سه‌ر ماکه‌ر ف نره‌خر فحل.

**سێلکه:** سێ حاچه ف سه‌شاخه.

**سێلکی:** ناوی گوندێکه ف نام دهی است.

**سێلگا:** سێڵاوگر ف مسیر سیل.

**سیلماته:** سه‌میر، سه‌مسیر، تڵفی ترێ ف تفالهٔ انگور فشرده.

**سێلمی:** هه‌ڵوایه‌که له ئاردو په‌نیر و دۆشاوی ده‌که‌ن ف نوعی حلوا.

**سێلۆقی:** سێ‌باز، سێ‌بازد ف ورزش پرش.

**سێلوُله:** خشڵێکی ژنانه ف زیوری است.

**سێلوه:** ناوی گوندێکه له لاجان ف نام دهی است.

**سێلوێ:** سێلوه ف نگا: سێلوه.

**سیله:** گۆشـه‌ی دیوار؛ ۲) گۆشه‌ی چاو؛ ۳) ره‌قه‌ی ناو ئاو ف ۱) زاویهٔ دیوار؛ ۲) گوشهٔ چشم؛ ۳) کشف، لاك‌پشت آبی.

**سێله:** به‌ردی نان له‌سه‌ر پێژان ف سنگ‌نان پزی بجای ساج.

**سیله‌خۆر:** جۆرێ ماسی ف نوعی ماهی.

**سیله‌ده‌بان:** گوندێکی کوردستانه به‌عسی ویرانی کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان ویران کردند.

**سیله‌سیاری:** گوندێکی کوردستانه به‌عسی ویرانی کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان ویران کردند.

**سێله‌ك:** شۆره‌کات، زه‌وینێ که خوێی تێکه‌ڵاوه ف زمین شوره‌زار.

**سێله‌که:** ناوی گوندێکه له موکوریان ف نام دهی است.

**سیله‌ی روحمێ:** به‌زه‌وی به‌خزماندا ف صلهٔ‌رحم.

**سیلی:** به ڵمه برنج ف کاه شالی.

**سێ لێڤ:** لچ ئه‌ستوُر ف لب کُلُفت.

**سیم:** ۱) تاڵی زیۆ، هه‌ودا له زیۆ؛ ۲) تێل؛ ۳) سیپه‌لاکی من ف ۱) سیم نقره؛ ۲) سیم؛ ۳) ریهٔ من.

**سیما:** ته‌حر و دیدار، بیچم ف سیما.

**سی‌ماسین:** بریتی له تۆزه بوُن ف کنایه از بخشم آمدن.

**سیماف:** ۱) سپیاو؛ ۲) رۆکه‌ش کراو به زیۆ ف ۱) سفید آب بزك؛ ۲) نقره‌اندود.

**سیم بەند:** تەل بەند [ف] سیم بند.
**سیمر:** باڵداریّکی چیروّکی و خەیاڵی [ف] سیمرغ.
**سیمرخ:** سیمر [ف] سیمرغ.
**سیمرغ:** سیمر [ف] سیمرغ.
**سیمرەکیّ:** سیّ جرتە، سیّ جرتەکی، سیّ زمەکی [ف] نگا: سیّ جرتەکی.
**سیمکە:** نیر، نیّلە [ف] یوغ.
**سیمکیّش:** کەسیّ کە تیّلی کارەبا جیّ بەجیّ دەکا [ف] سیمکش.
**سیمن:** چیّکراو لە زیّو [ف] سیمین.
**سیمورغ:** سیمر [ف] سیمرغ.
**سیمەرخ:** سیمر [ف] سیمرغ.
**سیمەڕوّ:** گای تویّڵ چەرموگ [ف] گاو پیشانی سفید.
**سیمەن:** ١) وەك زیّو، لە ڕەنگی زیّو؛ ٢) ناوە بوّ ژنان [ف] ١) سیمین؛ ٢) نام زنانه.
**سیمەه:** گەمەیەکی دیّهاتیانی کوردە [ف] از بازیهای روستاییان کرُد.
**سیّمینە:** جاریّ سیّهەم: (بژمەی **سیّمینە** دەڵیّن باشە) [ف] سومین، بار سوم.
**سین:** ١) ناوی پیتیّکە لە ئەلف و بیّتکە؛ ٢) سیپەلاکمان؛ ٣) یەکیان لە بیست و نوّ زیادە [ف] ١) حرف سین؛ ٢) ریەما؛ ٣) سی تا هستند.
**سیّن:** ١) ئەستیّن؛ ٢) لە دوان یەك زیاترن [ف] ١) پسوند بمعنی گیرنده و خریدار؛ ٢) سەتا هستند.
**سینا:** گوندیّکی کوردستانە بەعسی ویّرانی کرد [ف] از روستاهای کردستان که بعثیان ویران کردند.
**سینامەکی:** سنامەکی [ف] گیاهی است مسهل.
**سینان:** گوندیّکی کوردستانە بەعسی کاولیان کرد [ف] روستایی در کردستان که توسط بعثیان خراب شد.
**سیّنج:** پەرژین، چیلە [ف] پرچین.
**سینجی:** داری سنجو [ف] درخت سنجد.
**سینچکە:** زیپکە، زیرك [ف] جوش ریز بر پوست.
**سینچکە سلاو:** چینچکە سلاو، باپشکیو [ف] گل مژه.
**سیّنزە:** سیازدە [ف] سیزده.
**سیسل:** گەوە، بروار، تەپەو قوڵکەی زوّری ناوچیا [ف] پستی و بلندی کوهستان.
**سینگ:** ١) لە زگ بەرەژوّر تاخوار مل، سنگ؛ ٢) بزماری گەورە لە دار، سنگ [ف] ١) سینه؛ ٢) میخ کلفت چوبی.
**سینگان:** ناوی گوندیّکە لە موکوریان [ف] نام دهی است.
**سینگ و بەر:** سینەو بەروّك [ف] سینه و آستین.
**سینگە:** لای پیّشەوە [ف] طرف جلو.
**سینگەباز:** سنگەباز [ف] نوعی پرش.
**سینگە و باز:** سنگەباز [ف] نوعی پرش.
**سیّنوّر:** سنوُر، کەوشەن، حدوُد [ف] مرز.
**سینە:** سینگ، لەزگ بەرەوژوّر تا بەرگەردن [ف] سینه.
**سینەباز:** ١) سنگەباز؛ ٢) سنگ و بەروّك ئاواڵە [ف] ١) نوعی پرش؛ ٢) سینەباز، سینه عریان.
**سینەبەرە:** بەرەی زینی ئەسپ [ف] سینه بند همراه زین.
**سینەبەن:** ١) سینەبەرە، بەرە؛ ٢) زەنبەریّکە لە گەردنەوە دیّتە سەر سنگ [ف] ١) سینه بند زین؛ ٢) گردنبند تا روی سینه.
**سینەبەند:** ١) سینەبەن؛ ٢) چاروّکەی سینەپوّش [ف] ١) نگا: سینەبەن؛ ٢) پیش بند تا روی سینه.
**سینەپاڵوُ:** ژان و برك لە سەرماوە [ف] سینه‌پهلو.
**سینەپوّش:** ١) چارەکەی سنگ پوّش؛ ٢) بەروانکەی مناڵ [ف] ١) پیش بند کارگر؛ ٢) سینه‌بند بچه.
**سینەڕیز:** ئاشق بەند [ف] زیوری که برسینه آید، سینه‌ریز.
**سینەك:** خاڵیّکە لە پەڕی قوماردا [ف] خالی در ورق بازی.
**سینە کەمان:** ئامرازیّکی موّسیقایە [ف] سینه‌کمان، ویلون.
**سینە کیّش:** دەستەو هەوراز، ئاماڵ هەوراز [ف] سر بالایی، سینه‌کش.
**سینەم:** ١) سیمەن؛ ٢) ناوی ژنانە [ف] ١) سیمین؛ ٢) نام زنانه.
**سینەما:** ویّنەی بزوّز شاندان لەسەر پەردەی سپی [ف] سینما.
**سینەمەکی:** سینامەکی، سەنامەکی [ف] نگا: سینامەکی.
**سینی:** دەفری یانی کانزا بوّ نانو خوان لەسەردانان، مە عجوّمە، مەجومعە [ف] سینی.
**سینیك:** دەوری، قاپی پەل [ف] دوری، بشقاب.
**سیّو:** ١) سیّف، سیّڤ؛ ٢) ژەنگە سوُرە [ف] ١) سیب؛ ٢) زنبور سرخ.
**سیوا:** سەوات، سەواد [ف] سواد.
**سیوات:** سەوات [ف] سواد.
**سیواخ:** سواخ [ف] گل اندود.
**سیواد:** سەوات [ف] سواد.
**سیواد بوُنەوە:** بریّتی لە شەرم نەکردنو ڕووُقایمی [ف] کنایه از پررو شدن.
**سیواغ:** سواخ [ف] گل اندود.
**سیواق:** سواخ [ف] گل اندود.
**سیواك:** کورتەداریّکی باریکە سەرەکەی دەکوتن و موسوڵمان لە دەمیانی وەردەدەن [ف] مسواك چوبی.
**سیوالا:** ڕەش ئەسمەر، ڕەشتاڵە [ف] سیه‌چرده.
**سیوجگەر:** سوُجگەر [ف] جگر و دل و قلوه.
**سیّوخاکی:** پەتاتە، پەرەلماسی [ف] سیب زمینی.
**سیّودو:** بریّتی لە دودلّی، دڕدوّنگی [ف] کنایه از تردّد، دودلی.
**سیّورسات:** سوُروسات [ف] سیورسات.
**سیوسیوە:** ١) تیف تیفە؛ ٢) سیقاڵ [ف] ١) دوباره زدن مو؛ ٢) صیقل.
**سیّوك:** ١) پەتاتە، یارەلماسی، کەرتوّڤل؛ ٢) سیّوەبن عەرزیلە [ف] ١) سیب زمینی؛ ٢) سیب زمینی استانبولی.
**سیّونگ:** ١) ڕەشانگ؛ ٢) سیاونە [ف] ١) بز موسیاه؛ ٢) گوشت بز.
**سیّونگی:** سیّ بەندە [ف] محل تلاقی مهره کمر و باسن.
**سیّوەبن عەرزیلە:** بنە گیایەکە لە پەتاتە دەکاو بە کاڵی دەیخوّن [ف] سیب زمینی ترشی.
**سیّ وەختە:** ١) بەیانو نیمەڕوّ و شیو؛ ٢) سیّ بەهاردیتو [ف] ١) سه وعدهٔ

صبح و ظهر و شام؛ ۲) سەبهار دیده.

**سێوەدین:** ناوی گوندێکە لە موکوریان [ف] نام روستایی است.

**سێوەر:** سا، سایە، سێبەر [ف] سایه.

**سێوەرمێ:** جۆرێ هەمرۆ [ف] نوعی گلابی.

**سێوەڕە:** سێ پەڕە [ف] شبدر.

**سێوەسوورە:** جۆرێ سێوی سوور [ف] سیب سرخ.

**سێوەلاسوورە:** جۆرێ سێوی زەردو سوور [ف] سیب نیمەسرخ.

**سێوەنگ:** سێ بەندە [ف] کمر، میان پشت و باسن.

**سێوەنگی:** رەشی زۆرجوان و بروسکەدار [ف] سیاه و براق و زیبا.

**سێو هەرمێ:** سێوەرمێ [ف] نوعی گلابی.

**سێوی:** منالی دای و باب مردو [ف] یتیم.

**سێویاگ:** سواو [ف] ساییده.

**سێویان:** سوون [ف] سودن، فرسودن.

**سێوی بن عەرز:** سێوەبن عەرزیلە [ف] سیب زمینی ترشی.

**سیویر:** تاوێ کە پێست تاوانگاز دەکا [ف] تابش سوزندهٔ پوست.

**سیە:** ۱) کێشێکە بەرانبەر بە دو کیلۆ؛ ۲) رەش [ف] ۱) وزنی برابر دو کیلو؛ ۲) سیاه.

**سێهـ:** ۱) سا، سایە، سێوەر، سێبەر؛ ۲) رك، تووڕەیی؛ ۳) چەرمی وشك هەڵاتوو [ف] ۱) سایه؛ ۲) خشم؛ ۳) چرم خشك شده.

**سێهڕابوون:** رك هەستان، تووڕەبوون [ف] به خشم آمدن.

**سیهەم:** یەکێ پاش بیستو نۆهەم [ف] سیم.

**سێهەم:** ژمارەیەك لە دوای دوهەم دێت [ف] سوم.

**سیهەمین:** سیهەم [ف] سیم.

**سێهەمین:** ئەوی دوای دوان [ف] سومی.

**سێ ینە:** سێمینە [ف] نگا: سێمینە.

**سێ یەك:** لە سێ پاز پازێك [ف] ثلث، یك سوم.

**سێ یەك بەر:** سەپانێ کە لە بەهرە سێ یەك دەبا [ف] مزدور کشاور که یك سوم بهره می برد.

**ش:** ١) پیتی پرسیار: (شده کەی؟)؛ ٢) هیچ، چ: (شنا کەم)؛ ٣) پیتی پێرا واتا: عەتف: (ئەو هات منیش هاتم)؛ ۴) پیتی فەرمان بە بێدەنگبوُن: (شْ بابزانین دەلێ چی)؛ ۵) ئاژەڵ، مەڕو بزن: (شڤان) ف ١) حرف پرسش؛ ٢) هیچ؛ ٣) حرف عطف؛ ۴) فرمان بەسکوت؛ ۵) کنایە از گله، رمه، بز و میش.

**شا:** ١) زل، زلتر؛ ٢) ئەستوُرتر؛ ٣) پاڵشا، پادشا؛ ۴) شیاوتر: (شاسوار)؛ ۵) داشێکی شەترەنج؛ ۶) دڵخۆش، شاد؛ ٧) خۆزی بە: (شا بە حاڵت)؛ ٨) بڕوانە، تواشاکە: (شا چەند جوانە)؛ ٩) داکی مێشەنگوینان: (شاهەنگ) ف ١) بزرگتر؛ ٢) ستبرتر؛ ٣) شاه؛ ۴) برازندەتر؛ ۵) شاه‌شطرنج؛ ۶) شاد؛ ٧) خوشا؛ ٨) نگاه‌کن؛ ٩) ملکه زنبور عسل.

**شاباجی:** خوشکی مێرد ف خواهر شوهر.

**شابادی:** دەفری گەورەی دارین ف بادیهٔ بزرگ.

**شابادیه:** شابادی ف بادیهٔ بزرگ.

**شاباز:** ١) بازی سپی؛ ٢) ناوە بۆ پیاوان ف ١) باز سفید؛ ٢) نام مردانه.

**شاباش:** ١) دڵخۆش بی، هەر بژی؛ ٢) بەخشش بە بەزمگێڕی زەماوەند ف ١) شاد باش؛ ٢) انعام خنیاگر.

**شاباڵ:** ١) پەڕە گەورەکانی باڵی مەل؛ ٢) ئەندازەی لە سەری پەنجەوە تا ئەستۆ ف ١) شهپر پرنده؛ ٢) اندازه از سر پنجه تا گردن.

**شابان:** هەشتەمین مانگی ساڵی نەچەق، مانگی پێش رەمەزان ف ماه شعبان.

**شابانه:** گیایەکە ف شابانك، علفی است.

**شابست:** بستی نێوان تەوەرەو پەڕی ئاسیاو ف میلهٔ رابط قطب و پرهٔ آسیا.

**شابو:** ١) کوندەبو، کوندەبەبو، کوندی گەورە؛ ٢) دڵی خۆش بو ف ١) جغد، بوف؛ ٢) شاد شد.

**شابۆق:** لقی گەورەی دار ف بزرگترین شاخهٔ درخت.

**شابوُن:** دڵخۆش بوُن، کەیف ساز بوُن ف شاد شدن.

**شابه:** دڵخۆش بە، هەر بژی ف شاد باش، زنده‌باشی.

**شابەڕو:** کەستانە، جۆرێ بەڕوی خڕی پانکەڵەی تێکوڵ رەشی ئاماڵ سوُرە ف شاه‌بلوط.

**شابەز:** گەورە بازرگانی شار، سەرۆکی بازرگانان ف سر بازرگان.

**شابەندەر:** ١) بەردەستی باڵوێز لە وڵاتی بێگانە، قونسوُر؛ ٢) برێتی لە بێ‌شەرم‌و زمان درێژ ف ١) کنسول؛ ٢) کنایه از زبان دراز بی‌شرم.

**شابەنەر:** شابەندەر ف نگا: شابەندەر.

**شاپ:** ١) ڕنو، کلێلە، ڕنی، کەوی؛ ٢) زللە، زلە؛ ٣) شەق تێهەڵدان بە پشتەپێ ف ١) بهمن؛ ٢) سیلی؛ ٣) تیپا، اردنگی.

**شاپاڵۆخ:** بەفرماڵی پان، وەروەرە ف پاروی پهن برف روبی، داموز.

**شاپاڵۆغ:** نگا: شاپاڵۆخ.

**شاپان:** داردەستی ئەستوُرو حولی ف چماق صاف و کلفت.

**شاپانکاری:** ١) بە شەق لێدان؛ ٢) بە زللە لێدان ف ١) تیپاکاری؛ ٢) سیلی زدن زیاد.

**شاپرزا:** پەرێشان‌و سەرلێ شێو یاگ ف پریشان حال.

**شاپرزه:** شاپرزا ف پریشان حال.

**شاپلیته:** پەڕۆی لەدار بەستراوی چەور کراوی ئاگرتێ‌بەردراو ف مشعل.

**شاپوراخ:** جۆرێ پەپوُلەی زلی خاڵ‌خاڵ ف نوعی پروانهٔ درشت.

**شاپه:** ١) ڕنو، کەویەبەفر، شاپ؛ ٢) تاوێرە بە رد، کەڤری مەزن کە لە چیا گلار دەبێتەوە؛ ٣) خۆیان، کلۆشی بەسەریەکادراو ف ١) بهمن؛ ٢) سنگ غلتان از کوه؛ ٣) تودهٔ ساقه‌های غلّه.

**شاپەڕ:** شاباڵی مەل ف شهپر.

**شاپەری:** ١) پەری هەرە جوان؛ ٢) ناوە بۆ ژنان ف ١) زیباترین پری؛ ٢) نام زنانه.

**شاپەریك:** پەپوُلە ف پروانه.

**شاپەسند:** ١) گوڵێکە رەنگاورەنگ؛ ٢) ناوی ژنانە ف ١) گل شاه‌پسند؛ ٢) نام زنانه.

**شاپەسەن:** شاپەسند ف نگا: شاپەسند.

**شاپەسەند:** شاپەسند ف نگا: شاپەسند.
**شاپینۆز:** پینەی هاوڕەنگی پینەکراو ف پینۀ همرنگ لباس.
**شات:** ۱) لکەداری تازەی یەك ساڵە، چرۆ؛ ۲) خۆهەڵکێشان: (**شات و شۆت**)؛ ۳) ئیفلیج؛ ۴) زیڕە، هەرا ف ۱) جوانۀ یکساله؛ ۲) لاف؛ ۳) فلج؛ ۴) جیغ.
**شاتار:** ئامرازێکی موسیقایە ف تار بزرگ نواختنی.
**شاتاڵ:** ۱) خرتو پرتی ناو ماڵ؛ ۲) جلکی دڕاو؛ ۳) پەلامار ف ۱) خرت و پرت اثاثیه؛ ۲) لباس کهنۀ پاره شده؛ ۳) حمله.
**شاتان:** ۱) زیقە، زیڕە، شات؛ ۲) زگڕەوانی؛ ۳) سپیندار، ئەسپیندار ف ۱) جیغ؛ ۲) اسهال؛ ۳) سپیدار.
**شاتاندن:** ۱) زیقاندن، زیڕاندن؛ ۲) ڕیانی گوی شل ف ۱) جیغ کشیدن؛ ۲) اسهالی ریدن.
**شاتاول:** ۱) پەلامار؛ ۲) تێڕاخوڕین؛ ۳) زیپك تێ گرتن ف ۱) حمله؛ ۲) نهیب؛ ۳) متلك، حرف تودار.
**شاتر:** ۱) بیادەی زۆر بەپێ؛ ۲) نان بە تەندوورەوەدەری نانەوایی ف ۱) پیادۀ بادپا؛ ۲) شاطر نانوایی.
**شاترنج:** گیایەکە ف گیاهی است.
**شاتك:** ڕەگی مل، دەماری ئەستۆ ف رگ گردن.
**شاتڵ:** گیایەکە بۆ دەرمان دەشێ ف گیاه روشنك.
**شاتللۆرە:** لەسەر تەنشت گلاربوونەوە ف به پهلو غلتیدن از بالا.
**شاتمان:** ۱) ناوی گوندێکە، ۲) ناوی جۆرە تفەنگێکە کاری وەستای گوندی شاتمانە ف ۱) نام دهی؛ ۲) نوعی تفنگ ساخت ده «شاتمان».
**شاتوو:** توەسوورە، تویسوور، گاتوو ف شاهتوت.
**شات و شۆت:** ۱) زۆر گوتنی بێ بەهرە؛ ۲) بڵاو کردنەوەی درۆی زل ف ۱) چانەزنی بیهوده؛ ۲) تبلیغات دروغین.
**شاتۆن:** داری پەڵك ف درخت غرب.
**شاتە:** ۱) بەدرۆ بەخۆداهەڵدان؛ ۲) نانی تەنکی تەندوور ف ۱) لاف و گزاف؛ ۲) نان لواش.
**شاتەڕە:** گیایەکە ف گیاه شاهتره.
**شاتەشات:** زەنازەنا ف سر و صدا و جنجال.
**شاتەلی:** زەردالۆیان هەنجیری پانەوە کراوی تەنك، نانەقەیسی ف لواشك.
**شاتیر:** داری گەورەی سەرخانو، کاریتە ف بالار.
**شاتیمان:** ڕستەی باوەری بە خواو پێغەمبەر ف کلمۀ شهادتین.
**شاتیمان هاوردن:** گوتنی شاتیمان ف گفتن کلمۀ شهادتین.
**شاتیمان هێنان:** گوتنی شاتیمان ف گفتن کلمۀ شهادتین.
**شاجوان:** تازەلاوی خوشیك ف برنای زیبا.
**شاجوور:** ساجوڕ ف ساجور.
**شاچاغ:** گوڵینگەو لەرزانەی سەر بۆجوانی ورازانەوە ف از زیور آلاتی که به سر می‌زنند.
**شاخ:** ۱) کێو، چیا؛ ۲) چیای بەردین؛ ۳) ڕەقی ڕەقی سەری حەیوان؛ ۴) لکی دار؛ ۵) بارووت دانی ڕاوکەر؛ ۶) زیقەو زیڕەی بەتووڕەیی؛ ۷) ڕووش، ڕووشە ف ۱) کوه؛ ۲) کوه سنگی؛ ۳) شاخ حیوان؛ ۴) شاخه؛ ۵) باروت دان شکارچی؛ ۶) فریاد خشمناکانه؛ ۷) خراش.
**شاخان:** ۱) گوڕە، زیڕەی بەقەڵسی و تووڕەیی؛ ۲) کێوان ف ۱) جیغ خشمناکانه؛ ۲) کوهها.
**شاخاندن:** زیقەزیق و هەرا کردن بە تووڕەیی ف بانگ و فریاد زدن با خشم.
**شاخانن:** شاخاندن ف نگا: شاخاندن.
**شاخانە:** پۆشانە ف حِقّ المرتع.
**شاخاو:** ڕووشاو ف خراشیده.
**شاخاوی:** مەڵبەندی کێوات ف منطقۀ کوهستانی.
**شاختێز:** بارووت دانی ڕاوچی، شاخ ف جای باروت شکارچی.
**شاختێزك:** شاختێز ف **نگا:** شاختێز.
**شاخدار:** ۱) حەیوانێ کە شاخی هەیە؛ ۲) بڕیتی لە دەویت؛ ۳) جۆرێ بەری دار مازو ف ۱) حیوان شاخدار؛ ۲) کنایه از قرمساق؛ ۳) نوعی ثمر مازوج.
**شاخ دەرێنان:** بریتی لە ئابڕو نەمان و خەجاڵەت بوون ف کنایه از رسوایی و سرافکندگی.
**شاخسپی:** جۆرێ ترێ ف نوعی انگور.
**شاخستان:** شاخاوی ف منطقۀ کوهستانی.
**شاخ ڤەدان:** پەرتاوتن، کەزاخە، هەڵپەرتاوتن ف هَرَس درخت.
**شاخ کردن:** ۱) ڕووشاندن؛ ۲) چەپۆکانە کردنی ئەسپ ف ۱) خراشیدن؛ ۲) روی دوپا ایستادن اسب.
**شاخوبەڵەك:** نازو نووز ف ناز و غمزه.
**شاخو داخ:** چڕوکێو ف کوه وکمر.
**شاخوڕ:** تەپۆڵکەی بەردین ف تپۀ سنگی.
**شاخە:** ۱) گوڕەو هەرا؛ ۲) دەنگی ڕووخانی کێو؛ ۳) لکی دار ف ۱) نعره و فریاد؛ ۲) صدای ریزش کوه؛ ۳) شاخه.
**شاخەبسکە:** گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدۀ کردستان توسط بعثیان.
**شاخەپیسکە:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.
**شاخەشینکە:** تەنکەبەردی کەوەرەنگی زۆر ناسك کە بە دەبست هەڵدەوەرێ ف پلمه سنگ نازك خاکستری رنگ که دردست می‌شکند.
**شاخەوان:** ڕازەوان ف کوه‌پیما.
**شاخی:** کێوی ف کوهی.
**شاخێ:** ئاواییەکە لە کوردستانی بەردەستی ترکان کە لە پێشودا میرنشین بووگە ف نام روستایی در کردستان ترکیه که در قدیم مقرّ حکومتی بوده.
**شاد:** دڵخۆش، بەکەیف، دەماخ چاخ، شا ف شاد.
**شادانە:** گیایەکە ف شاهدانە.

**شادبوُن:** شابوُن [ف] شادشدن.
**شادمان:** دڵخۆش، شا، شاد [ف] شادمان.
**شادمانی:** ۱) دڵخۆشی؛ ۲) بەزم‌و داوەت، زەماوەند [ف] ۱) شادمانی؛ ۲) جشن و سرور، عروسی.
**شادوشوکور:** دڵخۆشی بە دۆست گەیشتنەوە لە پاش دوُوری [ف] شادی به دوست رسیدن بعد از هجران.
**شادومان:** شادمان [ف] شادمان.
**شادومانه:** شاتیمان [ف] کلمهٔ شهادتین.
**شاده:** ۱) کەسێ کە ئاگای لە روداویکە؛ ۲) شتێ کە کەسێ پێی ئاگادارە؛ ۳) شاتیمان؛ ۴) تبلی دۆشاومژە؛ ۵) داری سنوُری کاو گەنم؛ ۶) دڵخۆشە [ف] ۱) گواه؛ ۲) گواهی؛ ۳) کلمهٔ شهادتین؛ ۴) انگشت سبابه؛ ۵) چوب مرز کاه و گندم در خرمن؛ ۶) شاد است.
**شادەئیمان:** شاتیمان [ف] کلمه شهادتین.
**شادەدان:** خەبەردان لە روُداوێ [ف] گواهی دادن.
**شادەمار:** رەگی هەرە ئەستوُر لە ئەندامی گیانداردا [ف] شاهرگ.
**شادەمەرگ:** سەکتە لەخۆشیان [ف] سکته کردن از شادی.
**شادەمەرگ بوُن:** سەکتە کردن لە بەر دڵخۆشی زۆر [ف] سکته کردن از شادی.
**شادەنوێژ:** تبلی شادە [ف] انگشت شهاده، انگشت سبابه.
**شادە و ئیمان:** شاتیمان [ف] کلمه شهادتین.
**شادە هێنان:** شاتیمان هێنان [ف] شهادتین گفتن.
**شادەیمان:** شاتیمان [ف] کلمهٔ شهادتین.
**شادی:** ۱) دڵخۆشی؛ ۲) شادومانی، داوەت‌و بەزم؛ ۳) مەیموُنی چکۆڵە، حەمتەر؛ ۴) ناوی ژنانە [ف] ۱) شادی؛ ۲) جشن و سرور؛ ۳) عنتر؛ ۴) نام زنانه.
**شادیانه:** ۱) زەماوەند، داوەت؛ ۲) مزگێنی بۆ خەبەری خۆش [ف] ۱) بزم وجشن عروسی؛ ۲) مژدگانی.
**شادیك:** وەروێرکە، دڵخۆشکەرەی خێزان: (شادیکامالێ) [ف] بچهٔ مایه دلخوشی خانواده.
**شار:** ۱) ئاوەدانی گەورەی بەدوُکان‌و بازار، باژێر؛ ۲) سەری مەیدانی وازی؛ ۳) ماڵی مێروُلەو زەردەواڵە؛ ۴) پاشگر بەواتا: رێك کوشین؛ ۵) داخی، گەرمی؛ ۶) سەر پۆشی ژنانە؛ ۷) دەسرۆکەی دەوری کڵاوی لباد [ف] ۱) شهر؛ ۲) آنسوی میدان بازی؛ ۳) لانهٔ مورچه و زنبور؛ ۴) پسوند به معنی فشار؛ ۵) داغی؛ ۶) سرپوش زنانه؛ ۷) دستمال دور کلاه نمدین.
**شارا:** ۱) ماسولکەی گەنم لەسەر خەرمان؛ ۲) کەمێ لە خۆیان کە لە درێژەوەیە؛ ۳) کای نێوان دیوارەی چاڵ‌و دەخڵ؛ ۴) گیشەی دەخڵی درواو [ف] ۱) تودهٔ گندم مستطیل شکل در خرمن؛ ۲) ساقه‌های غلّهٔ برهم ریخته؛ ۳) کاه تیغه میان غلّه وخاك در چاله؛ ۴) تودهٔ درویده.
**شاران:** ۱) گەردانەی لە گوێزو بادام؛ ۲) چەند باژێڕ [ف] ۱) گردنبند از بادام و گردو؛ ۲) شهرها.
**شارانگەڕ:** گەڕیدە بە باژێڕاندا [ف] جهانگرد.
**شارانگەشت:** شارانگەڕ [ف] جهانگرد.
**شاراوه:** بەنهێنی تاقەت کراو [ف] نهفته شده.
**شاربەدەر:** لە ئاوایی درکراو [ف] نفی بلد، تبعید شده.
**شاردار:** دارۆغە [ف] شهردار.
**شاردراوه:** شاراوە [ف] نگا: شاراوه.
**شاردن:** بە نهێنی تاقەت کردن [ف] نهفتن، پنهان کردن.
**شاردنەوه:** شاردن [ف] پنهان کردن.
**شارراوه:** شاراوە [ف] پنهان کرده شده.
**شارسان:** شار [ف] شهر، شهرستان.
**شارسانی:** خەڵکی شار، باژێڕی [ف] شهروند، شهرنشین.
**شارستان:** شارسان [ف] شهر، شهرستان.
**شارستانی:** شارسانی [ف] شهروند، شهرنشین.
**شارستانێتی:** ژیانی شارستان، ژیاری [ف] زندگی شهری، تمدّن.
**شارستانیەتی:** شارستانێتی [ف] زندگی شهری، تمدّن.
**شارستێن:** ۱) شارستان؛ ۲) ناوی گوندێکە لە موکوریان؛ ۳) گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد [ف] ۱) شهرستان؛ ۲) نام دهی در کردستان؛ ۳) از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.
**شارستێنه:** ۱) شارستان؛ ۲) ناوی گوندێکە لە کوردستان [ف] ۱) شهرستان؛ ۲) نام دهی است.
**شارسێنه:** گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد [ف] از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.
**شارگڕ:** وشەیەکە لە بازی چاوشارکێدا [ف] اصطلاحی در قایم موشك بازی.
**شارگه:** حەشارگە، ڕەبەت، سیپە [ف] کمین شکارچی.
**شارۆ:** ۱) پاشەرۆك؛ ۲) گیشەگەنم؛ ۳) خۆیان، کۆ کردنەوەی گەنمی درواو لەسەر جێ‌خەرمان [ف] ۱) پساچین؛ ۲) دسته‌ای گندم درو شده؛ ۳) جمع‌آوری گندم درو شده در خرمن.
**شاروال:** ۱) ئاواڵ کراسی بەگنجی ژنانە؛ ۲) پانتۆڵی پیاوانە [ف] ۱) نوعی تنبان زنانه؛ ۲) شلوار مردان.
**شارۆخ:** چەمیلە، ترۆزی، ترێزوُ [ف] خیار چنبر.
**شارۆد:** مەلێکی زەردی ئاماڵ سەوزە [ف] پرنده‌ای است.
**شاروُر:** شالوُل، گاوانی، سێرو، رەشۆڵە [ف] پرندهٔ سار.
**شارۆق:** شارۆخ [ف] خیار چنبر.
**شارۆکه:** شاری پچوُك، قەسەبچە [ف] شهرك.
**شاروُکه:** شارۆکە [ف] شهرك.
**شاروەری:** باژێڕی، ژیان لەشار [ف] شهرنشینی.
**شاروێران:** مەڵبەندێکەلەموکوریان [ف] ناحیه‌ای در کردستان.
**شاره:** شارا [ف] نگا: شارا.
**شارەدێ:** گوندی زۆر قەوغا [ف] ده بسیار بزرگ.
**شارەزا:** ۱) بەڵەد، بەرێگەزان؛ ۲) زانا لە کارو بار [ف] ۱) بلد؛ ۲) دانا و آگاه به کار.
**شارەزایی:** ۱) بەڵەدی، رێ‌ناسی؛ ۲) پسپۆڕی [ف] ۱) راه‌شناسی؛ ۲)

خبرگی و تخصّص.

**شاره‌زوُر:** مه‌ڵبه‌ندێکی پان‌و به‌رین له کوردستان ف منطقه‌ای وسیع در کردستان.

**شارەگ:** شاده‌مار ف شاهرگ.

**شاره گرد:** له‌و گونـدانـه‌ی کوردستـانـه که به‌عسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**شاره‌مروچه:** کونی مێرولان ف لانهٔ مورچگان.

**شاره‌مێروُ:** شاره مروچه ف لانهٔ مورچگان.

**شاره‌وان:** داروغه ف پلیس شهری.

**شاره‌وانی:** بنکه‌ی داروغه‌ی شار ف شهر بانی.

**شارەه :** شاده‌مار ف شاهرگ.

**شارەهەن:** ئاوەڕۆی گه‌وره‌ی ئاوی پیس ف مجرای بزرگ فاضلاب.

**شاری:** باژێڕی، شارسانی، شارستانی ف شهروند، شهرنشین، شهری.

**شارێ:** جاده‌ڕێ، ڕێگه‌ی پان‌و سه‌ره‌کی ف شاهراه.

**شاریا:** گونـدێکـه له کوردستـان به‌عسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**شـاریاگه‌وه:** شاراوه ف نهفته شده.

**شاریان:** ۱) شاردنه‌وه؛ ۲) گه‌رم داهاتن ف ۱) نهفتن؛ ۲) زیاد شدن حرارت.

**شاریای:** گه‌رم داهاتو ف گرم شده.

**شارێز:** نه‌خۆشی پدو، پوُك زامار بوُن ف بیماری لثّه.

**شارێشه:** ره‌گی هه‌ره ئه‌ستوُری دار ف شاهرگ درخت.

**شارێگه:** شارێ ف شاهراه.

**شاز:** ۱) جۆرێ چیتکی زراو؛ ۲) هه‌ڵکـه‌وتـه، به‌هونه‌ر ف ۱) نوعی نی باریك؛ ۲) لایق، نابغه.

**شازاده:** ۱) به‌چکـه‌شـا؛ ۲) برێتی له لاوی ئاکـاربـاشی دڵاوا ف ۱) شاهزاده؛ ۲) کنایه از جوان نیکوکار و دست و دلباز.

**شازبه‌ند:** چوُزه‌له، دوُزه‌له ف نوعی ساز بادی.

**شازده:** ۱) ژماره‌ی دوای پازده؛ ۲) شازاده ف ۱) عدد شانزده؛ ۲) شاهزاده.

**شازده‌مین:** شازده‌هه‌م ف شانزدهم.

**شازده‌هه‌م:** ژماره‌ی دوای پازده‌هه‌م ف شانزدهم.

**شازده‌هه‌مین:** شازده‌هه‌م ف شانزدهم.

**شازوقاز:** چیایه‌که له موکوریانی کوردستان ف کوهی در کردستان.

**شازی:** جۆرێ مه‌یمون ف نوعی بوزینه.

**شاژن:** ۱) ژنی شا؛ ۲) پاڵشای مێچکه؛ ۳) سه‌ره‌ژن ف ۱) شهبانو؛ ۲) پادشاه مادینه، ملکه؛ ۳) زن کدبانوی کدخدامنش.

**شاسـوار:** ۱) سواری چاك، سواری بێوێنـه؛ ۲) ناوی پیاوانـه ف ۱) شهسوار؛ ۲) نام مردانه.

**شاسه:** ۱) جه‌نگه‌ی بارانی به‌هار، شه‌سته باران؛ ۲) ژیهاتی ف ۱) موسم بارانهای بهاری؛ ۲) شایسته.

**شاسه‌لیم:** بی‌بی‌جان خانم ف خیمه شب بازی.

**شاسـه‌یوان:** ۱) چادری گه‌وره، خێوه‌تی زل؛ ۲) هۆزێکی کۆچـه‌ره له ئێران ف ۱) خیمهٔ بزرگ؛ ۲) ایلی کوچنده در ایران، شاهسَوَن.

**شاش:** ۱) پێچی سه‌ر، مێزه‌ر؛ ۲) ئه‌سپێی ئاردو گه‌نم؛ ۳) قومـاشی شل ته‌نـدراو، نه‌سفت؛ ۴) پیر بـڵاوی؛ ۵) سه‌هـوکـار؛ ۶) میز، گمێز؛ ۷) تێکه‌ڵ‌و ئاڵۆزاو؛ ۸) خێل، خوێل ف ۱) عمامه؛ ۲) شپشك آرد و غلّه؛ ۳) پارچه متخلخل؛ ۴) پریشانی فکر؛ ۵) اشتباه کننده؛ ۶) شاش؛ ۷) پریشان و سردرگم؛ ۸) لوچ.

**شاشان:** ناوه بۆ ژنان ف نام زنانه.

**شاشبه‌ن:** میزگیران ف شاش بند.

**شاشخاپێن:** مه‌لاو شێخی خه‌ڵك خه‌ڵه‌تێن ف روحانی عوام فریب.

**شاشك:** ۱) مێزه‌ر، پێچی سه‌ر؛ ۲) ناوی گه‌مه‌یه‌که ف ۱) عمامه، دستار؛ ۲) نوعی بازی کودکانه.

**شاش گه‌ور:** ۱) مێزه‌رسپی؛ ۲) برێتی له په‌یڕه‌وانی مه‌زه‌بی دورزی ف ۱) عمامه سفید؛ ۲) کنایه از پیر و مذهب درزی.

**شاشوبێش:** ۱) خوارو خێچ؛ ۲) قسه‌و کارێ که پیاو سه‌ری لێ ده‌ر ناکا ف ۱) کج و کوله؛ ۲) مبهم و نامعلوم.

**شـاشـوپه‌ڕ:** جلکی زۆر جوان‌و ڕێك‌و پێك ف لباس شیك و مرتّب.

**شاش‌و وێش:** شاشو بێش ف نگا: شاشو بێش.

**شاشه:** ۱) شاسه؛ ۲) زه‌وی خه‌ت دراو بۆ توتن چاندن، شه‌سته ف ۱) موسم بارانهای بهاری؛ ۲) زمین شیار شده برای کشت توتون.

**شاشـه‌ك:** ۱) مه‌لێکـه بۆری پنـۆك پنـۆك له کۆتـر گچکه‌تره گۆشتی ده‌خـورێ، کورکـور، قه‌تێ؛ ۲) روبـابه ف ۱) پرندهٔ سنگخواره؛ ۲) رباب، آلت موسیقی.

**شاشیك:** شاشك، مێزه‌ر، پێچی سه‌ر ف دستار.

**شاشین:** میز کردن ف شاشیدن.

**شاف:** ده‌رمانێ که ده‌قنگی ڕاده‌که‌ن ف شیاف.

**شاف پێ هه‌ڵگرتن:** برێتی له خاپاندن ف کنایه از فریب دادن.

**شافر:** ۱) بیاوانی چۆڵ‌و هۆڵ؛ ۲) ده‌شتی پان‌و به‌رینی بێداروبار ف ۱) بیابان؛ ۲) جلگهٔ وسیع بی‌درخت.

**شافعی:** سوننی په‌یڕه‌وی ئیمامی شافعی ف شافعی مذهب.

**شاف هه‌ڵگرتن:** خۆ ده‌رمان کردن به شاف ف شیاف برداشتن.

**شاق:** ۱) ده‌نگی که‌روێشك؛ ۲) مه‌لێکی لنگ درێژی باڵ شینه هه‌ر له ده‌م‌ئاو ده‌ژی، شاوه، شاهۆ ف ۱) صدای خرگوش؛ ۲) بوتیمار.

**شاقا:** هه‌نگاو، گاو، پا بڵاودانان له زه‌وی ف گام.

**شاقاشین:** مه‌لی شاق ف پرنده‌ای آبزی، بوتیمار.

**شاقه‌شین:** شاقاشین ف پرنده‌ای آبزی، بوتیمار.

**شاقێز:** ۱) ده‌بـه‌نـگ، گێل‌و حوڵ؛ ۲) گیایه‌کـه ف ۱) ابله، کودن؛ ۲) گیاهی است.

**شاقین:** باقاندنی که‌روێشك ف صدای خرگوش.

**شاق:** ۱) ماسیگره، مه‌لێکی سپیه به‌کۆمه‌ڵ ڕاوه‌ماسی ده‌که‌ن؛ ۲) قیژه‌ی مریشـك؛ ۳) لێدان به پشتی پێ، شاپ؛ ۴) هه‌نگـاو؛ ۵) زلله؛ ۶) کۆچانی بازی کۆیێن ف ۱) مرغ ماهیخوار؛ ۲) جیغ مرغ؛ ۳) تیپا؛ ۴)

گام: ۵) سیلی: ۶) چوگان گوی بازی.

**شاقام:** هەنگاوی زل [ف] گام فراخ.

**شاقاو:** شاقام [ف] گام فراخ.

**شاقروان:** بۆق، بەق [ف] قورباغه.

**شاقڵ:** دامێنە کەوای لاهەڵتلیشاو [ف] چاك دامن.

**شاقوبانێ:** گەمەی گۆبازی [ف] چوگان بازی.

**شاقوت:** بەرتاوتنی لکی زل [ف] هرس شاخەهای ستبر.

**شاقول:** ۱) شاقوڵی بەنا: ۲) تەڵە کەروێشك [ف] ۱) شاقول: ۲) تلهٔ خرگوش.

**شاقوڵ:** ۱) شاقوبانێ: ۲) ئامرازێکی بەنایانە: ۳) تەڵە کەروێشك [ف] ۱) چوگان بازی: ۲) شاقول: ۳) تلهٔ خرگوش.

**شاقولاپ:** قولایی درشتی ماسی گرتن [ف] قلّاب بزرگ ماهیگیری.

**شاقۆلانێ:** شاقوبانێ [ف] چوگان بازی.

**شاقولیاغا:** مەلێکی رەشی بچوکە، هەنجیرخۆرە [ف] پرندەایست.

**شاقەشین:** شاقاشین [ف] پرندەای آبزی، بوتیمار.

**شاقەل:** شاقل [ف] چاك دامن قبا.

**شاقەڵ:** بارست، ئەستوورایی و درێژایی [ف] حجم، اندازه، قطر.

**شاقەڵدار:** زەلامی ئەستوور [ف] تنومند.

**شاك:** ۱) مرقەی نێری لە تێ بەرداندا: ۲) برە، کۆز، پارچەی براو لە میوە، قاش: ۳) بەرانی دوسـالـە، شەك بەران [ف] ۱) صدای شاك در وقت جفتگیری: ۲) قاچ: ۳) قوچ دوساله.

**شاکار:** کاری زۆر باش [ف] شاهکار.

**شاکاشی:** دەفری گەورەی گلێنی رەنگ کراو [ف] شهکاسه.

**شاکاك:** وردەمووی زەردی لاجانگی لاو کە دوایی دەوەرێ، گەندەموو [ف] موهای زرد رخسار نوجوانان.

**شاکم:** رەنگە، وێ دەچێ، وادیارە [ف] گو یا، شاید.

**شاکول:** پێلاوی بن چەرمی سەرموو [ف] نوعی پای‌افزار مویین.

**شاکۆل:** شاپان، تێلای لووس و بێ گرێ [ف] چوبدستی هموار.

**شاکۆن:** گۆچان [ف] عصای سرخمیده.

**شاکـە:** ۱) باڵـەفـرەی جوچکـەی تازە فێرە فرین: ۲) پاڕانەوە [ف] ۱) پرپرزدن جوجهٔ پرنده: ۲) لابه.

**شاکەشاك:** پاڕانەوەی زۆر [ف] لابه و التماس زیاد.

**شاکـەل:** گوندێکە لە کوردستان بەعسیَ وێرانی کرد [ف] از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**شاگا:** شابە، وشەیەکە لە جیاتی رۆژباش و سڵاو [ف] شادزی، حرفی بجای سلام.

**شاگرد:** بەردەستی وەستا [ف] شاگرد.

**شاگردانه:** بەخششی شاگرد [ف] انعام شاگرد.

**شاگردە:** دارێکی سەربەئاڵقەیە جۆلا تاڵی رایەڵی پێ دەبژێرێ [ف] چوبی چنگالی که بافنده تارهای بافت را بدان شمارد.

**شاگـونـج:** دارێکە وەك رەحەتی دەخرێتە دەم دۆلاشەوە [ف] چوبی قیف مانند در دهانهٔ ناو آسیاب.

**شاگـوڵ:** ۱) گوڵی زلی وینـە مافوورە: ۲) گوڵی سەرەکی دەخڵ [ف] ۱) نقش بزرگ قالی: ۲) خوشهٔ برتر غلّه.

**شاگول بەند:** بێن خۆشکە، بۆخۆشکە، گیایەکە [ف] گیاهی است.

**شاگە:** شاگا [ف] نگا: شاگا.

**شاگەردانی:** پاشاگەرانی، دنیای بێ‌قانوون و پڕ لە ئاژاوە [ف] آشوب و بلوا.

**شاگەشکە:** ۱) بوورانەوە لە خۆشیان: ۲) پوکاوڵە، چەموڵە [ف] ۱) حالت غش از شادی: ۲) پنجه گذاشتن، پنجه بەطرف کسی گرفتن با اهانت.

**شاگەشکەبوون:** بوورانەوە لە خۆشیان [ف] غش کردن از شادی.

**شاگـەشکـە لێنـان:** پوکـاوڵە لێنان، چەموڵە لێنان [ف] ام کردن، پنجه گذاشتن، پنجه بەطرف کسی گرفتن بااهانت.

**شال:** ۱) رانـك: ۲) چەتـانی کڵۆش را گوێزتن بۆ سەر خەرمان [ف] ۱) شلوار از بافتهٔ محلّی: ۲) گاری مخصوص انتقال درویده به سرخرمن.

**شاڵ:** ۱) شال: ۲) پارچـەی سەوزی تایبـەتی پێچ و پشتێنی سەید: ۳) بووزو [ف] ۱) شلوار از بافتهٔ محلّی: ۲) پارچهٔ سبز ویژهٔ سادات: ۳) پشم بافته.

**شالاو:** پەلامار [ف] هجوم، حمله.

**شاڵك:** عابا، سەرجلی تەنکی فش و فۆڵ [ف] عبا.

**شاڵ گەردەن:** پارچەی دەوری مل داپۆشین [ف] شال گردن.

**شالوو:** کوللێرەی بە شەدانەوە [ف] گرده نان با شاه‌دانه.

**شالووت:** کەسێ لووتی زل بێ [ف] دماغ گُنده.

**شالوور:** ریشۆڵەی رەش، گاوانی سیا [ف] سار سیاه.

**شالووز:** ریاباز، مەرایی کەر [ف] متملّق.

**شالووڵ:** شالوور [ف] سار سیاه.

**شالوویل:** شالوور [ف] سار سیاه.

**شالیار:** ۱) پاتشـای شارێك: ۲) ئاواڵ و دۆستی شا [ف] ۱) شهریار: ۲) همدم شاه.

**شاڵیار:** شالیار [ف] نگا: شالیار.

**شالیل:** شالوور [ف] سار سیاه.

**شاڵینه:** پارچەی چوارگۆشە لە خوری [ف] پارچهٔ مربّع پشمین.

**شام:** ۱) شاری پاتـەختی سووریا: ۲) نانی شێوان: ۳) تەنگی نوێژی شێوان: ۴) شامنم [ف] ۱) دمشق: ۲) وعـده غذای شام: ۳) بعد از غروب: ۴) شاه هستم.

**شامات:** ۱) دەشتی شۆرەکات: ۲) مەڵبەندێکە لە کوردستان: ۳) وشەی دۆڕانی شەترنج [ف] ۱) جلگهٔ شورەزار: ۲) ناحیه‌ای در کردستان: ۳) شەمات شطرنج.

**شامار:** حەزیا، زەها [ف] اژدها.

**شاماکی:** مەمك‌بەند [ف] پستان بند.

**شامبۆز:** ئازا، جوامێر [ف] جوانمرد شجاع.

**شامبۆیی:** گەماڵی خێرا کە ئاگاداری لەڕان و مێگەل دەکا [ف] سگ گلّه.

**شام خواردن:** شێوخواردن [ف] شام خوردن.

**شام دەرزی:** جۆرێ شمشێری بەناوبانگە [ف] نوعی شمشیر مشهور.

**شام کردن:** شام خواردن [ف] شام خوردن.

**شامۆیی:** جۆرێ توتن [ف] نوعی توتون.

**شامی:** ١) شوتی، جەبەژ، ژەبەش، شفتی، هەنی؛ ٢) گەنمەشامی، گولەپێغەمبەرە، گولەگەنم؛ ٣) قەلەموونە، عەلەشیش؛ ۴) پاش وشەی مریشکە دێت: (مریشکە **شامی**)؛ ۵) خەڵکی شام؛ ۶) سوکەڵەناوی شامراد [ف] ١) هندوانه؛ ٢) ذرّت، بلال؛ ٣) بوقلمون؛ ۴) نوعی ماکیان؛ ۵) اهل دمشق؛ ۶) مخفّف نام شاه‌مراد.

**شامی کەباب:** قیمەی لێکدراوی پارچەکراوی لەتاوەدا سوورەوەکراو [ف] کباب شامی.

**شامێر:** مرۆچەی درشت [ف] مورچهٔ درشت.

**شامێرو:** شامێر [ف] مورچهٔ درشت.

**شان:** ١) خاڵی سەر گۆنا، توتە، نیشان؛ ٢) پیل، نێوان سەری قۆڵ و مل؛ ٣) شکۆ و گەورەیی؛ ۴) دەرەجەو پلە؛ ۵) جێگەی گەراو هەنگوینی مێش، شانە؛ ۶) ملەی کێو [ف] ١) خال برگونه؛ ٢) کتف؛ ٣) شأن و شکوه؛ ۴) درجه، پایه؛ ۵) شانهٔ‌زنبور؛ ۶) ستیغ کوه.

**شانا:** ١) رەوانەی کرد؛ ٢) ئامرازی موداهێنان، شانە، شە [ف] ١) فرستاد؛ ٢) شانهٔ مو.

**شاناز:** ناوی ژنانە [ف] شهناز، نام زنانه.

**شانازی:** تاریفی کارچاکی خۆ یان کەسێ تر کردن، ئیفتخار، فەخر [ف] افتخار، مباهات.

**شانای:** ڕاوەشاندنی دار [ف] تکان دادن درخت.

**شان‌بەشان:** پێکڕا، بەیەکەوە [ف] دوشادوش هم.

**شان‌پۆش:** شتێ کە بەسەر شان‌دا دەدرێ [ف] کتف پوش.

**شان‌خەفانن:** داهاتنەوە، چەماندنەوەی شان [ف] خود را خم کردن.

**شان‌داچەکان:** لاشان خواربوون و پێسیر شل و ئاواڵەبوون [ف] شانه کج و یقه نامرتب و باز بودن.

**شان‌داچەکاو:** لاشان خوار [ف] شانه کج و خمیده.

**شان‌داخستن:** بریتی لە تەسلیم بوون [ف] کنایه از تسلیم شدن.

**شان‌دادان:** لەسەر تەنشت خۆدرێژ کردن [ف] به پهلو دراز کشیدن.

**شان‌دان:** نیشان دان، شتێ بەرچاوی کەسێ دان، ڕانان [ف] نشان دادن، نمایش دادن.

**شان‌داهێشتن:** شان داخستن [ف] کنایه از تسلیم شدن.

**شاندن:** ١) ناردن، رەوانە کردن؛ ٢) چاندنی تۆم؛ ٣) بەدەم باوە بزووتن: (شەماڵ **بیشانێ** یەخەی کەتانت)؛ ۴) رەوادیتن: (گوتیان پێت ناشێ بەڵام من **شاندم**) [ف] ١) فرستادن؛ ٢) بذر پاشیدن؛ ٣) جنبیدن توسط باد؛ ۴) روادیدن.

**شاندەلیك:** زەردەواڵە، زەرگەتە [ف] زنبور زرد کوچك.

**شاندی:** ١) رەوانەکراو؛ ٢) چاندراو؛ ٣) ڕاژێندراو [ف] ١) فرستاده؛ ٢) پاشیده؛ ٣) جنبیده.

**شانزدە:** دوای پازدە [ف] شانزده.

**شانزدەمین:** شانزدەهی [ف] شانزدهم.

**شانزدەهی:** دوای پازدەیەم [ف] شانزدهم.

**شانزدەهەمین:** دوای پازدەهەمین [ف] شانزدهمین.

**شانزە:** ژمارە شازدە [ف] عدد شانزده.

**شانس:** بەخت، ئیغباڵ، تاڵە، تالح [ف] شانس.

**شانشین:** ١) بەربێڵایی نزیك پەنجەرە لە ناو ئۆدەدا بۆ دانیشتنی نەجیمزادان؛ ٢) پاتەختی مەملەکەت [ف] ١) شاه‌نشین؛ ٢) پایتخت.

**شانگ:** شان، نێوان سنگ و مل [ف] کتف.

**شانۆ:** ١) سەکۆی کۆسەبازی، شوێنی هونەر نواندنی وازی کەران؛ ٢) نومایشتی چیرۆك [ف] ١) صحنهٔ نمایش؛ ٢) بازی کردن در صحنه.

**شانۆشەپیلك:** دیمەنی لای سەروی لەش [ف] نمای طرف بالایی قد و قامت.

**شانۆگەری:** کایە کردنی شانۆ [ف] نمایش دادن تئاتر.

**شانە:** ١) ددانەدارێ کە سەرو ڕیشی پێ دادەهێنن؛ ٢) چەند شیشەئاسنی سەرتیژی دەدار کوتراو بۆ خوری و مو لێك هەڵوەشاندن؛ ٣) چەوکێش؛ ۴) داروغە؛ ۵) شانی هەنگوین؛ ۶) سەرکاری گوند؛ ٧) ئامرازێکی دەزگای جوڵا، دەفەی جوڵایی [ف] ١) شانهٔ سر؛ ٢) شانهٔ فلزی پشم و موصاف کن؛ ٣) شن کش؛ ۴) داروغه؛ ۵) شانهٔ عسل؛ ۶) مباشر ارباب در امور خرمن؛ ٧) ابزاری در کارگاه بافندگی.

**شانەك:** بەڵگە، نیشانە، دەلیل [ف] دلیل، مدرك.

**شانەکار:** بووك جوانکەر [ف] مشاطهٔ عروس.

**شانەکەر:** ئەوی خوری و کوڵکە بەشانە دەکا [ف] شانه‌زن پشم و مو.

**شانەگورگ:** گیایەکە لە پەنجەی گورگ ئەکا [ف] گیاهی است شبیه پنجه گرگ.

**شانەگەر:** وەستای شانە دروست کردن [ف] شانه‌ساز.

**شانەوشان:** ١) درێژایی ملەی کێو، یاڵەو یاڵی کێو: (**شانەوشان** ڕێگەیە)؛ ٢) شان ڕاژاندن لەرۆیشتنا: (**شانەوشان** دەڕوا بەرێوە)؛ ٣) هەڵگەڕانەوە لە تەنشت بۆ سەر تەنشتێ‌تر: (**شانەوشانت** کەم دەستە ملانت کەم) [ف] ١) طول تیغهٔ کوه؛ ٢) شانه حرکت دادن در راه رفتن؛ ٣) غلتیدن بر پهلو.

**شانی:** ١) شانەی سەر؛ ٢) نیشان، بەڵگە [ف] ١) شانهٔ سر؛ ٢) دلیل، مدرك.

**شانی‌دان:** نیشان دان، خستنەبەرچاو [ف] نشان دادن.

**شانیك:** بەڵگە، شانی [ف] دلیل، مدرك.

**شانی کەباب:** شامی کەباب [ف] شامی کباب.

**شانین:** ١) تووڕدان؛ ٢) ڕاژاندن [ف] ١) پرت کردن؛ ٢) جنبانیدن.

**شاو:** شیوەڵە، دۆڵی بووچك [ف] درّهٔ کوچك.

**شاواز:** شاباز [ف] نگا: شاباز.

**شاواش:** شاباش [ف] نگا: شاباش.

**شاوان:** زەوینی بەردەڵان [ف] سنگلاخ.

**شاوانە:** شابانە [ف] گیاه شابانك.

**شاوانی:** دڵخۆشی، شادومانی [ف] شادمانی.

**شاوانێ:** ناوی گوندێکە لەلای شنۆ ف نام دهی است.

**شاور:** ۱) فیتو، فیتکە بەدەم، فیقەکێشان؛ ۲) هەرئامرازێکی موسیقی کە پفی پێدا دەکەن. *وەك بلوروزورناو...* ف ۱) سوت زدن؛ ۲) ساز بادی.

**شاوڵ:** شاقولی بەنا ف شاقول.

**شاووت:** جۆرێ ماسی، سورە ماسی ف نوعی ماهی.

**شاوە:** شاف، شاڤەشین ف نگا: شاف.

**شاوەت:** ئاوی پشت، ئاوێ کە لە رەحەت بوندا دەرژێ ف آب پشت، منی.

**شاوەشینە:** شاف، شاڤەشین ف نگا: شاف.

**شاوەلە:** ناوی گوندێکە لە کوردستانی موکوریان ف نام دهی است.

**شاوی:** دز، کەسێ کە کاری دزی کردنە ف دُزد.

**شاوێژ:** شاڤێژ ف کودن.

**شاه:** پاڵشا ف شاه.

**شاهانە:** ۱) وەك پاڵشایان؛ ۲) شت یان کاری هەرە باش ف ۱) شاهانە؛ ۲) درخور شاهان.

**شاهگێلە:** مرۆچەی درشت، میروەعەجەمانە ف مورچهٔ درشت.

**شاهۆ:** ۱) شاف، شاوە؛ ۲) ناوی چیایەکە لە کوردستان؛ ۳) ناوی پیاوانە ف ۱) نگا: شاف؛ ۲) نام کوهی در کردستان؛ ۳) نام مردانه.

**شاهەنشا:** پاڵشای پاڵشایان ف شاهنشاه.

**شاهەنگ:** دایکی مێشە نگوینان ف ملکه زنبور عسل.

**شاهی:** ۱) پاڵشایەتی؛ ۲) زەماوەند؛ ۳) پارەی هەرە کەمی سکەی ئێران ف ۱) پادشـاهی؛ ۲) جشن و سرور عروسی؛ ۳) کوچکترین واحد پول ایران.

**شاهیك:** بریقەدار، بەتروسکە ف درخشان.

**شاهـێن:** ۱) داری درێژی تەرازو کە تاتـەرازوی لێ قایم کراون؛ ۲) زوانـەی تەرازو؛ ۳) مەلێکی ڕاوکـەرە ف ۱) شاهین ترازو؛ ۲) زبانهٔ ترازو؛ ۳) شاهین پرندهٔ شکاری معروف.

**شاهینـە:** ۱) خۆشی‌و شادی؛ ۲) ژنی‌شا، شاژن ف ۱) شادمـانی؛ ۲) ملکه، شاهبانو.

**شاهینەت:** شایی، بەزم‌و هەرای زەماوەند ف جشن عروسی.

**شایار:** شالیار ف ندیم شاه.

**شایان:** ۱) لایق، هێژا؛ ۲) چەند شا ف ۱) شایان، سزاوار؛ ۲) شاهان.

**شایانە:** ۱) شادیانە؛ ۲) شاهانە ف ۱) نگا: شادیانە؛ ۲) نگا: شاهانە.

**شایستە:** ۱) لایق؛ ۲) ناوی ژنانە ف ۱) شایستە؛ ۲) نام زنانە.

**شایسە:** شایستە، لایق ف شایستە.

**شایك:** ساف، حولی، لوس، بێ گرێ‌وگنج ف صاف.

**شایلۆغـان:** بەزم‌و هەرای زەمـاوەند بە دەهۆڵ‌و زوڕنا ف جشن عروسی همراه دهل و سرنا.

**شایلەخان:** شایلۆغان ف نگا: شایلۆغان.

**شایلەغان:** شایلۆغان ف نگا: شایلۆغان.

**شاینە:** شادانە ف گیاه شاهدانە.

**شاینەشەکێ:** جۆرێ رەقس‌و سەما ف نوعی رقص گروهی.

**شایەت:** ۱) شادە، ئاگادار لە ڕوداو؛ ۲) رەنگـە، وێدەچێ، دوورنیە ف ۱) گواه؛ ۲) ممکن است، شاید.

**شایەتا:** رەنگە، وێدەچێ ف شاید.

**شایەتی:** ۱) شادە، خەبەرداری لە ڕوداو؛ ۲) پاتشایەتی ف ۱) گواهی؛ ۲) پادشاهی.

**شایەتی‌دان:** شادەدان، خەبەردان لە ڕوداو ف گواهی دادن.

**شایەد:** شایەت ف نگا: شایەت.

**شایەدا:** شایەتا ف شاید.

**شایەدی:** شادە، شایەتی ف گواهی.

**شایەدی‌دان:** شایەتی‌دان، شادەدان ف گواهی دادن.

**شایەر:** ۱) خۆوێژ، شاعری نەخوێندەوار؛ ۲) شاعر؛ ۳) گورانی بێژ ف ۱) شاعر درس نخوانده؛ ۲) شاعر؛ ۳) ترانەخوان.

**شایەن:** ۱) شاهێنی تەرازو؛ ۲) شیاوی، هێژایی ف ۱) شاهین ترازو؛ ۲) لیاقت.

**شایی:** شاهی ف نگا: شاهی.

**شایی‌بەخۆبون:** بە حاڵی خۆ کەیف سازبون ف بە وضع خود شاد بودن.

**شایی‌پێ‌بون:** بە شتێ دڵخۆش بون ف بەچیزی دلخوش داشتن.

**شاییش:** خەم، کەسەر، کول ف غم.

**شایی‌کەر:** بەشدار لە زەماوەندا ف شرکت کننده در جشن عروسی.

**شایێن:** شاهێنی تەرازو ف شاهین ترازو.

**شب:** چون، وەك، وێنە ف مانند.

**شباك:** سەرپۆشی بەپەنجەرەی سەر گۆڕی پیاوچاکان ف شبکهٔ مزار، ضریح.

**شباندن:** ناسینەوە، دیتن‌و کەوتنەوە بیر ف بازشناختن، دیدن و بە یاد آوردن.

**شبتی:** شفتی، زەبەژ، جەبەش، شوتی، هەنی، ژەبەش ف هندوانە.

**شبی:** وەکو، لەرەنگی ف همانند.

**شپ:** خشە، دەنگی وێك کەوتنی شتی وشك وەك پوش‌و بەرگی نوێ ف صدای بهم ساییدن خشك، خش خش.

**شپرزە:** ۱) پەرژو بڵاو؛ ۲) حاڵ پەرێشان ف ۱) پراکندە؛ ۲) پریشان حال.

**شپرزیاگ:** ۱) بڵاوبوگ، تێکەڵ‌و پێکەڵ؛ ۲) لێ شێوان‌و پەرێشان بون ف ۱) پراکندە و نامرتّب شدن؛ ۲) پریشان حال شدن.

**شپڕێو:** شپرزە ف نگا: شپرزە.

**شپك:** خێشك ف مالهٔ شخم صاف کن.

**شپل:** ساوای تازەزاو ف نوزاد.

**شپنە:** ۱) بنەبڕ، لەبنەهاتن؛ ۲) شپك، خێشك ف ۱) ریشەکن؛ ۲) مالهٔ شخم صاف کن.

**شپەستە:** راواندنی نە خۆش، قسە پەڕاندن ف هذیان گفتن.

**شپەشپ:** خشەخش ف خش‌خش.

**شپی:** ڕێژنە، رەهێڵە ف رگبار تند باران.

**شپین:** دادانی ڕێژنەی باران ف بارش رگبار باران.

**شت:** ۱) تشت، چشت؛ ۲) بەئاو خاوێنی کردەوە: (دەستی خۆم **شت**)؛ ۳) موی راستو لول نەخواردو ف ۱) چیز، شیء؛ ۲) ماضی شستن؛ ۳) موی صاف و بدون پیچش.

**شتاق:** هیچ یەك ف هیچکدام.

**شتانێ:** سنجوق بازی ف نگا: سنجوق بازی.

**شتران:** شاخەشینکە ف نگا: شاخەشینکە.

**شتراو:** بەئاو خاوێنەوە کراو ف شُستە.

**شترمر:** باڵدارێکی زۆر زەلامە وەك مامر دەچێ پێرەوەو ناتوانێ بفرێ ف شترمرغ.

**شترنج:** سەترنج ف شطرنج.

**شتری:** رێزە گوڵینگەی سەری ژنان، گێل گێلە ف صف منگولهٔ زینتی سر زنان.

**شتل:** گیاو دارێ بەدەست دەچەقێندرێ ف نشا.

**شتڵ:** شتل ف نشا.

**شتلاندن:** چەقاندنی شتل ف نشاندن نشا.

**شتڵجار:** زەوی کە شتڵی تێدا چێندراوە ف نشازار.

**شتلین:** دەزەوی چەقین ف بەزمین فرو شدن.

**شتم:** ۱) تشتی من؛ ۲) بەئاو خاوێنم کردەوە ف ۱) اشیاء من؛ ۲) شستم.

**شتمەك:** جلو کەل وپەل ف رخت و اثاث.

**شتن:** ۱) بەئاو خاوێن کردنەوە؛ ۲) برێتی لە سەرکۆنەو جوێن پیدان؛ ۳) تشتی ئێمە ف ۱) شستن؛ ۲) کنایە از سرزنش کردن و دشنام دادن؛ ۳) اشیاء ما.

**شتنەوە:** ۱) شتنی دانەوێڵە؛ ۲) برێتی لە لۆمەو جوێن پێدان؛ ۳) دوبارە شتن ف ۱) شستن حبوبات؛ ۲) کنایە از سرکوفت؛ ۳) دوبارە شستن.

**شتــو:** ۱) جۆرێ هەرمێ؛ ۲) بەئاو خاوێنەوە کراو؛ ۳) ئێوە شتتان ف ۱) نوعی گلابی؛ ۲) شستە؛ ۳) شماشستید.

**شتۆ:** ۱) وشەی دنەدانی سەگ بۆ شەڕ؛ ۲) چلۆن؟ چۆن؟ ف ۱) کلمهٔ تحریك سگ برای جنگ؛ ۲) چطور؟ چگونە؟.

**شتوشۆ:** باڵاو، جل شوتن ف شست و شوی، رختشویی.

**شتوشۆدەرێنان:** بەجوێن ئابڕو بردن ف با دشنام آبرو بردن.

**شتوُف:** زەنگەتەترێ، تلیسك ف خوشهٔ کوچك انگور، تلسك.

**شتوك:** ئاوی لە دۆ تکاوی کوڵێندراو کە دەرمانی ئاوانگازە ف آب چکیدە از دوغ جوشیدە کە دوای آفتابزدگی است.

**شتوکە:** چشتی چکۆلە ف چیز کوچك، چیزك.

**شتومەك:** شتمەکە ف لباس و اثاث.

**شتەو:** شتۆ ف نگا: شتۆ.

**شتی:** ۱) جەبەش، زەبەش، شوُتی، شفتی، شمتی، هەنی، ژەبەژ؛ ۲) بە ئاو خاوێنی کردەوە؛ ۳) وەکو، وێنەی، شبی ف ۱) هندوانە؛ ۲) شُست؛ ۳) مانند.

**شتیار:** بێ پێخەف، بێ سەرنناز: (ئەزو لۆ **شتیار** نفستم) ف آسمان جُل.

**شتیکانێ:** ئەوە چیە، مەتەڵۆکە ف چیستان، معمّا.

**شتین:** چکوُس، رژد، رەزیل، دەس قوُچاو، پیسکە ف خسیس.

**شحنە:** داروغە ف شحنە.

**شخاب:** مەتکەو، کونکەرە، شخاف ف متّە.

**شخـاتـە:** زلـوُکـەی سەر بەدەرمان بۆ ئاگر پێ کردن، کرمیت، گۆگرد، شەمچە ف کبریت.

**شخارتە:** شخاتە ف کبریت.

**شخاف:** شخاب، مەتکەو ف متّە.

**شخب:** خوشەی شیر کە دەیرێژنە ناو دەفرەوە ف صدای شیر کە در ظرف ریزند.

**شخت:** زەرگی دەروێشان ف سیخ دراویش.

**شختە:** سەرمای پاییز کە زەرعات سیس دەکا ف سرمای نابهنگام پاییز.

**شخرە:** بارەگیای یەکسەری ف بار یك ستور از گیاە.

**شخــرەکێش:** داری بن بارەگیا کە سەرپشتی بارەبـەری دەخـەن ف چوبهای زیر بار گیاە بر پشت باربر.

**شخل:** بەسەریەکا هاتن، لەسەر یەك کەڵەك ف برهم انباشتگی.

**شخلی:** بەسەریەکا هاتو، کەڵەك بوُگ ف برهم انباشتە.

**شخلین:** شخل ف برهم انباشتگی.

**شخۆ:** ژخۆ ف نگا: ژخۆ.

**شخەڵ:** ۱) ئەشخەڵ، دەوەن جاڕ؛ ۲) خیزەڵان؛ ۳) بێشەی دەم ڕۆُبار؛ ۴) شێخەڵ ف ۱) زمین پر بوتهٔ درخت؛ ۲) شنزار؛ ۳) بیشهٔ انبوە کنار رود؛ ۴) هرس درخت.

**شْد:** بەستن ف بستن.

**شداندن:** توند بەستن ف تُند بستن.

**شڕ:** ۱) بەرگی دڕاو؛ ۲) پەشێو، پەڕیشان، بێ سەرو بەر: (حاڵم **شڕە**)؛ ۳) جرت، زڕت ف ۱) لباس کهنە پارە؛ ۲) پریشان و آشفتە؛ ۳) شیشکی.

**شرپ:** دەنگی دەئاو کەوتنی شتی سەنگین ف صدای در آب افتادن سنگین.

**شرت:** ۱) نادیار، گوم: (**شرت** و گوم بوە)؛ ۲) دەوەنێکە لقەکانی دەکەنە گەسـك؛ ۳) چەڵغو، چەرغو ف ۱) ناپیدا؛ ۲) درختچەای است؛ ۳) جاروی ترکەای.

**شرتا:** گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**شرتك:** خەڵفەمێو ف جوانهٔ تاك.

**شرتـۆپ:** دەنگی بەزەمیندا کەوتنی نەرمی سەنگین ف صدای افتـادن سنگین نرم.

**شرتوشۆدەرێنان:** شتوشۆدەرێنان ف رسوا کردن، با دشنام آبرو بردن.

**شرتوشۆڵێ بڕین:** شرت و شۆدەرێنان ف رسوا کردن، با دشنام آبرو بردن.

**شرتوگوم:** نادیارو ون ف ناپیدا، گم.

**شرتی:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان کە بعثیان آن را ویران کردند.

**شرد:** شتی، بەئاو خاوێنی کردەوە: (جلەکانی **شرد**) [ف] ماضی شستن.

**شردان:** گۆشتی ئیشك کراو بۆ زستان [ف] گوشت خشکیده برای زمستان.

**شردن:** شتن [ف] شستن.

**شردنەوە:** شتنەوە [ف] نگا: شتنەوە.

**شردو:** بەئاو خاوێنەوە کراو [ف] شسته.

**شرژاو:** پێ کەوتو، لایق [ف] سزاوار.

**شرش:** پەمۆی پێچراوی گلۆلە کراو، کەلوە پەمۆ [ف] غنده، غوزه پنبه.

**شڕشڕ:** ١) دەنگی ڕژانی ئاو؛ ٢) زۆر کۆن و دڕاو: (جلەکانی **شڕشڕن**) [ف] ١) شرشر آب؛ ٢) بسیار کهنه و ژنده.

**شرقە:** قرمە، ڕەشۆکی، جۆرێ تفەنگی ڕاو [ف] نوعی تفنگ شکاری.

**شرك:** ١) پلۆسك، لۆساوك، لۆس؛ ٢) شتری [ف] ١) ناودان؛ ٢) نگا: شتری.

**شرکاك:** مەلێکە لە کۆتر پچوکتر و گۆشت ناخۆش [ف] پرنده‌ای کوچکتر از کبوتر و بدگوشت.

**شرماپ:** زلله، شەپلاغە، شەقام [ف] سیلی.

**شڕمبڕم:** قسەی بێ تام و بێ مانا [ف] سخن یاوه و مفت.

**شرن:** ١) شفـرە، ددانی زەقی یەکانە؛ ٢) شرماپ [ف] ١) دندان برآمدهٔ گراز؛ ٢) سیلی.

**شرنـاو:** گونـدێکی کوردستـانە بەعسی کاولی کرد [ف] نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**شرنگ:** دەنگی کەوتنی شتی قورس [ف] صدای افتادن جسم سنگین.

**شرنگە:** ١) دەنگی لێك دانی شیر و خەنجەر؛ ٢) شەلین؛ ٣) شنگڵ، بزاو [ف] ١) چکاچك سلاح سرد؛ ٢) لنگیدن؛ ٣) نگا: شنگڵ.

**شڕۆ:** لێکدانەوەی خەون [ف] تعبیر خواب.

**شڕودڕ:** ١) لەت لەت و پارچــە پارچــە، زۆر دڕاو؛ ٢) بریتــی لە مرۆی بێ‌حەیاو زمان پیس [ف] ١) پاره‌پاره شده؛ ٢) کنایه از آدم بدزبان و ستیزه جو.

**شڕوشاتاڵ:** خرت و پرت [ف] خرت و پرت.

**شڕوشیتاڵ:** زۆر دڕاو [ف] کهنه پاره و فرسوده.

**شڕوشیواڵ:** شڕوشیتاڵ [ف] کهنه پاره و فرسوده.

**شڕۆقە:** شڕۆ [ف] تعبیر خواب.

**شڕۆقە کەر:** لێکدەرەوەی خەون [ف] معبّر خواب.

**شڕۆکەر:** شڕۆقەکەر [ف] معبّر خواب.

**شروەهەلاڵێ:** گولێکە [ف] گلی است.

**شڕە:** ١) کەلەپوور، میرات؛ ٢) کەل پەل، جلك؛ ٣) ناومال؛ ٤) بێ‌نرخ؛ ٥) جلکی دڕاو [ف] ١) مرده‌ریگ، ماتــرك؛ ٢) البســه؛ ٣) اثــاثیه؛ ٤) بی‌ارزش؛ ٥) لت‌وپار.

**شڕها:** وشەیەکە بۆ گاڵتە پێ کردن، تەحا، تڕحێو [ف] کلمهٔ تمسخر.

**شڕهاو:** شڕها [ف] کلمهٔ تمسخر.

**شڕەخۆر:** سیرمەخۆر [ف] دله دزد.

**شڕەق:** درز، قەڵش [ف] ترك، درز.

**شڕەقیان:** درزبردن، قەڵش‌بردن [ف] ترك برداشتن.

**شڕەگر:** میراتگر [ف] وارث.

**شڕەوبـڕە:** ١) کۆتـاڵی جلك؛ ٢) خرت و پرتی ناو ماڵ [ف] ١) پارچه و لباس؛ ٢) خرت و پرت، اثاثیه.

**شڕەوپڕە:** جلکی کۆنەو دڕاو [ف] لباسهای مندرس.

**شڕەوشیتاڵ:** شڕ و شیتاڵ [ف] لباسهای کهنه و فرسوده.

**شڕەومڕە:** شڕەو بڕە [ف] نگا: شڕەو بڕە.

**شرێ:** گونـدێکی کوردستـانـە بەعسی کاولی کرد [ف] نام روستـایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**شریت:** بەنی چەند لۆی لێك بادراو، گشتەك [ف] رشتهٔ تابیده.

**شریتە:** زنجیرە [ف] زنجیره.

**شریخ:** دەنگی زۆر توندو لەپڕ وەك دەنگی هەور، گرمە [ف] صدای رعدآسا.

**شریخاندن:** گرماندن [ف] غرّش تند و شدید.

**شریخانن:** شریخاندن [ف] غرّش تند و شدید.

**شریخە:** شریخ [ف] صدای رعدآسا.

**شریخەشریخ:** گرمەی بەشوێن یەکا [ف] غرّش پیاپی.

**شریژ:** ئەسریلك، چرێش، سریش [ف] سریش.

**شرێس:** چرێش، شرێش، ئەستریلك [ف] سریش.

**شریفا:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد [ف] روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**شریق:** شریخ [ف] نگا: شریخ.

**شریقە:** شریخە [ف] نگا: شریخه.

**شریمـك:** گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد [ف] از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**شرین:** دژی تاڵ [ف] مزهٔ شیرین.

**شڕین:** دەنگی داڕژانی ئاو [ف] شرشر آب.

**شرینقە:** ئاودوزەك، دەرزی دەرمان دە لەش کردن [ف] سرنگ.

**شریك:** ١) ئاواڵ، هاوڕێ؛ ٢) هاوبەش [ف] ١) همراه، دوست؛ ٢) شریك.

**شریە:** تەنکەبەزی ژێر پێست [ف] لایهٔ پیه زیر پوست.

**شژ:** ١) بەردی سوکەڵەی ناسك و تورت، شاخە شینکە؛ ٢) کێم و زوخ؛ ٣) ڕاو، شکار [ف] ١) سنگ متخلخل زودشکن؛ ٢) چرك زخم؛ ٣) شکار.

**شژڕێژ:** سەربانێ کە ورکە بەردی ناسکی لە سەر ڕۆ کراوەو تەپاوە [ف] بام پوشیده از سنگ ریزهٔ نازك و ترد.

**شست:** ١) سست؛ ٢) شتن [ف] ١) سست؛ ٢) شُستن.

**شستوشۆ:** شتوشۆ، بالاو [ف] رختشویی.

**شش:** شاردنـەوە لە زمـانی منـداڵانـەدا: (مێوژت دەدەمێ **ششی** کە با نەیبینن) [ف] نهفتن در زبان بچگانه.

**ششـت:** ١) شت، تشـت، ئەشـت، چشت؛ ٢) رابــردوی شتن: (جلم **ششت**) [ف] ١) چیز، شیء؛ ٢) ماضی شستن.

**ششتن:** شتن [ف] شستن.

**ششتنەوە:** شتنەوە [ف] نگا: شتنەوە.

**ششتو:** ۱) شردو، بەئاو خاوێن کراو؛ ۲) شتو ف ۱) شسته؛ ۲) شستید.

**شعوٗر:** ئاوەز، هۆش ف احساس، عقل، شعور.

**شعەفی:** جۆرێ ترێ رەشکە ف نوعی انگور سیاه.

**شغاب:** سمە، سمبە، مەتکەو ف متّه.

**شغارتە:** شخارتە، شخاتە ف کبریت.

**شفا:** چابوٗنەوە لە نە خۆشی ف شفا.

**شفات:** تکابۆ کردن لە رۆژی سەلاّ ف شفاعت در روز قیامت.

**شفت:** دۆشینی شیر ف دوشیدن شیر.

**شفتە:** ۱) شامی کەباب؛ ۲) حەڕی خۆش نەکراو؛ ۳) قسلاّو؛ ۴) موی بەشانەنەکراو؛ ۵) زارۆ لە بێشکە دەرهێنان؛ ۶) یەکەمجار موٗ لە سەری زارۆ هەڵپاچین ف ۱) شامی کباب؛ ۲) گِل قوام نگرفته؛ ۳) آهك سرشته؛ ۴) موی آشفته؛ ۵) بچه را از گهواره بیرون آوردن؛ ۶) نخست بار موی سر بچه را قیچی کردن.

**شفتەزێ:** ژنێ کە زۆر زگ‌وزا دەکا ف زنی که زیاد زایمان کند.

**شفتەژە:** زکپڕێ کە منالّی شیرەخۆرەی هەبێ ف حامله‌ای که بچهٔ شیرخواره دارد.

**شفتەژێ:** شفتەژە ف نگا: شفتەژە.

**شفتی:** جەبەش، زەبەش، هەنی، شوٗتی ف هندوانه.

**شفتی تاڵك:** کاڵەکەمارانە، گوژاڵك ف هندوانهٔ ابوجهل.

**شفتی تاڵە:** شفتی تاڵك ف هندوانهٔ ابوجهل.

**شفتیك:** ۱) قەڵەمە لێدان؛ ۲) هەڵبەرتاوتن ف ۱) قلمه‌زدن؛ ۲) هَرَس کردن.

**شفتێل:** ۱) توٗڵی باریك‌و چیرٚ کە بۆ سەبەتەچنین باشە ف ترکهٔ نازك و نرم برای سبد بافی.

**شفحەڵە:** بەری داری کفر ف ثمر درختچه‌ایست.

**شفرە:** ۱) بڕەی بەراز، شرن؛ ۲) ئاسنێکی دەسکداری دەمپانی تیژە بۆ چەرم بڕین؛ ۳) درەوشەی کەتیرەکەران کە لە لاسکی گوێنی دەدەن؛ ۴) ئەندازەی بارێك لە گیاو کلۆش، شغرە؛ ۵) نەشتەری برینگەران ف ۱) دندان برجستهٔ گراز؛ ۲) شفرهٔ چرم بری؛ ۳) شفره‌ای که گون کتیرا را سوراخ کند؛ ۴) اندازهٔ باریك ستور از گیاه و ساقهٔ غلّه؛ ۵) نیشتر جرّاحی.

**شفسك:** چەقالەکێویلە ف چغالهٔ کوهی.

**شڤ:** ۱) توٗڵ؛ ۲) نەواڵ، دۆڵی زۆر پچوٗك لە چیا؛ ۳) سەربەرەژێر؛ ۴) ئێکەم کوڵانی دۆشاو ف ۱) ترکهٔ نازك؛ ۲) درهٔ کوچك؛ ۳) نشیب؛ ۴) اوّلین جوشیدهٔ شیرهٔ انگور.

**شڤار:** ۱) ساوار؛ ۲) درێژو بڵند ف ۱) بلغور؛ ۲) بلند طویل.

**شڤارۆك:** زبارەی ساوارکوتان ف بلغور کوبی گروهی.

**شڤارە:** بڵند باڵای ناقوڵا ف دراز قدّ بد قواره.

**شڤارێ:** ڕچە، ڕێچکە ف راه باریك مالرو.

**شڤان:** ئاگاداری ئاژەڵ ف چوپان.

**شڤان خاپێن:** مەلێکی پچوٗکی بۆرەلۆکەیە لە پاساری گەورەتر ف پرندهٔ شبان فریبك.

**شڤاندیلکە:** مەلیچك ف گنجشك.

**شڤانکوژ:** شڤان خاپێن ف شبان فریبك.

**شڤتاندن:** لەسەرەوە بۆ خوار دادڕاندن ف از بالا به پایین پاره کردن.

**شڤر:** جۆرێ کەڵە کێوی ف نوعی بز کوهی.

**شڤژ:** شژ، شاخە شینکە ف نگا: شاخه‌شینکه.

**شڤشینك:** دارێ کە گەڵا ناوەرێنێ ف درختی که خزان ندارد.

**شڤك:** توٗڵ، شڤك ف ترکهٔ نازك.

**شڤن:** بزنەکێوی ف بز کوهی.

**شڤنە:** خێشك ف شخم صاف کن.

**شڤەرێ:** ڕێچکە، باریکەڕێ ف راه‌مالرو.

**شڤیلە:** شڤارێ ف باریکه راه.

**شقارتە:** شخاتە ف کبریت.

**شقاقی:** نەخۆشی سمی وڵاخە بەرزە ف بیماری سم دام.

**شقاڵتە:** شخاتە ف کبریت.

**شقشق:** ۱) ئاوازی خوێندنی مەل؛ ۲) جریوەی چیشکە ف ۱) صدای مرغان؛ ۲) جیك جیك گنجشك.

**شقڵ:** مۆری دارین بۆ نیشانە کردنی خەرمان ف مهر چوبین خرمن نشانه کردن.

**شقڵە:** خەستە و نەخۆش ف خسته و بیمار.

**شقوٗق:** جۆرێ هەرمێ کێویلە ف نوعی گلابی وحشی.

**شقین:** گرمە کردنی هەور ف صدای رعد.

**شك:** دودڵی، دڕدۆنگی ف شك.

**شکات:** دادبردنەبەر، گازندە، گلەیی ف شکایت.

**شکار:** ۱) ڕاو، نچیر؛ ۲) کەڵەکەبەرد؛ ۳) بەردەڵان ف ۱) شکار؛ ۲) تودهٔ سنگ؛ ۳) زمین سنگلاخ.

**شکارتە:** چاندن بۆ هەژاران بە خێر ف زرع و کشت برای فقرا بصورت احسان.

**شکارتەکێڵ:** زەوی کە بە شکارتە داچێنراوە ف زمین کشت شده برای فقرا.

**شکارگە:** جێڕاو، ڕاوگە ف شکارگاه.

**شکاك:** هۆزێکە لە کوردستان ف عشیره‌ای در کردستان.

**شکان:** ۱) وردبوٗن، لەت‌بوٗن؛ ۲) ڕاکردن لە شەڕ؛ ۳) هەڵوەشانی ڕۆژوٗ، هەڵوەشانی دەسنوێژ؛ ۴) هاتنە خواری نرخ؛ ۵) لە قەدرو حورمەت کەوتن ف ۱) شکسته شدن؛ ۲) هزیمت؛ ۳) باطل شدن روزه و دست نماز؛ ۴) پایین آمدن نرخ؛ ۵) از قدر و منزلت کاسته شدن.

**شکاندن:** ۱) وردو لەت کردن؛ ۲) هەرزان کردنی نرخ؛ ۳) ڕاونانی دوژمن ف ۱) شکستن؛ ۲) پایین آوردن نرخ؛ ۳) هزیمت دادن دشمن.

**شکاندنەوە:** ۱) لکەدار داشکاندن؛ ۲) دەست کردن بە گەڵالێکردنەوەی توٗتن؛ ۳) منالّ فێرە کارکردن؛ ۴) خەجاڵەت کردن؛ ۵) چای لە چادان تێکردن‌و دە چادان کردنەوە؛ ۶) بن کوڵ کردن و گڵ وە سەرلا سکدانی شیناوەرد؛ ۷) دوبارە شکاندن؛ ۸) گێڕانەوەی کەروێشك لەغاردا ف ۱) شاخه از درخت شکستن؛ ۲) برگ از توتون چیدن؛ ۳) کار به بچه

یاددادن؛ ۴) خجلت دادن، شرمنده کردن؛ ۵) چای ریختن و باز در قوری کردن؛ ۶) خوابانیدن ساقهٔ بوته‌های پالیزی در خاک؛ ۷) دوباره شکستن؛ ۸) برگرداندن خرگوش در دو.

**شکانن:** شکاندن ف نگا: شکاندن.

**شکاننەوە:** شکاندنەوە ف نگا: شکاندنەوە.

**شکـانەوە:** ۱) داهاتنی لك؛ ۲) لێکردنەوەی گەڵاتوتن؛ ۳) خەجاڵەت بوُن؛ ۴) کەم‌کردن ف ۱) خمیدن شاخه رو به زمین؛ ۲) چیدن برگ توتون؛ ۳) خجل شدن؛ ۴) کاستن.

**شکـاو:** ۱) لەت‌بوُگ؛ ۲) لەشکـری راکـردو؛ ۳) هەرزان بوُگ ف ۱) شکسته؛ ۲) هزیمت یافته؛ ۳) ارزان شده.

**شکاوای:** هەڵکەندن ف کَندن.

**شکر:** سپاس ف شُکر.

شکرۆ: ناوی پیاوانە ف نام مردانه.

**شکری:** ناوی پیاوانەو ژنانە ف نام مردانه و زنانه.

**شکس:** شکان ف نگا: شکان.

**شکست:** شکان ف نگا: شکان.

**شکستۆك:** لەشکان نزیك، کەل‌وپەلێ کە لەوانەیە بشکێ ف شکستنی.

**شکستە:** ۱) لەشکری ڕاکردو؛ ۲) جۆرێ خەت؛ ۳) خەربشتەی خانو ف ۱) لشکر شکست خورده؛ ۲) خط شکسته؛ ۳) طاق گنبدی شکل.

**شکستی:** کەم کردن، لەکەمی‌دان: (ئەمساڵ **شکستیم** هێناوە) ف کاستی.

**شکل:** ۱) بیچم، بەچك، تەرح، سیما؛ ۲) وێنە، ڕەسم ف ۱) قیافه؛ ۲) عکس، رسم.

**شکڵ:** شکل ف نگا: شکل.

**شکل کێش:** وێنەگر، وێنەکێش ف عکّاس، صورت‌گر.

**شکڵ کێش:** شکل کێش ف نگا: شکل کێش.

**شکلنوُس:** ڕوُنوُسی، لەبەرنوُسینەوە ف رونویسی.

**شکنا:** مەبەست، دۆز ف مقصود، مرام.

**شکۆ:** پایەبەرزی، جەلال، گەورەیی ف شکوه، عظمت.

**شکۆفە:** گوڵی دار ف شکوفهٔ درخت.

**شکـۆفیانـەوە:** ۱) گوڵ دەرکردنی دار؛ ۲) ئاهەك وەختێ ئاوی بەسەرا ئەکەن ف ۱) شکوفه‌زدن؛ ۲) آهك وقتی که بر آن آب ریزند.

**شکۆك:** جۆرێ هەمرۆ ف نوعی گلابی.

**شکۆکە:** کرۆسك، هەرمێ کێویلە ف نوعی گلابی جنگلی.

**شکولك:** تیخوڵ، تویکڵ، تێکوڵ ف پوسته، قشر.

**شکە:** بەچکە بەرازی دوساڵە ف بچّه خوك دوساله.

**شکەبەرد:** ئیشکەکەڵەك ف بنا از سنگ بدون گل.

**شکەس:** شکست، شکان ف شکست.

**شکەست:** شکست، شکان ف شکست.

**شکەستن:** شکاندن ف شکستن.

**شکەستی:** شکاو ف نگا: شکاو.

**شکەفت:** ئەشکەوت ف غار.

**شکـەفتـامـەمێ:** گونـدێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**شکەفتێ:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**شکەڤ:** تەبەق، سینی لە دار ف طبق چوبین.

**شکەڤا:** ۱) نانی تیری و ناسك؛ ۲) هەرشتێ لەبەرناسکی زو هەڵبوەرێ ف ۱) نان لواش؛ ۲) هر چیز تُرد و نازك.

**شکەڤك:** ۱) بادی دارین؛ ۲) تەشتی دارین ف ۱) ظرف چوبین؛ ۲) تشت چوبین.

**شکەلك:** لەتەسواڵەت ف پاره سفال.

**شکەناندن:** شکاندن ف نگا: شکاندن.

**شکەو:** دەفری لە سواڵەت، ئەشکەو ف ظرف سفالین.

**شکەولەت:** شکاوی دەفری سواڵەت، ئەشکەولەت ف شکستهٔ ظرف سفالین.

**شکیاگ:** شکاو ف نگا: شکاو.

**شکیان:** شکان ف نگا: شکان.

**شکیانەوە:** شکانەوە ف نگا: شکانەوە.

**شکیاو:** شکاو ف نگا: شکاو.

**شکێر:** ۱) کەلێنـەبەردی فرەوان لە کێو؛ ۲) سەری شاخ ف ۱) شکاف فراخ در کوه سنگی؛ ۲) قلّهٔ کوه سنگی.

**شکینا:** شکاندی ف شکست، ماضی شکستن.

**شکیناندن:** شکاندن ف شکستن.

**شگۆفە:** شکۆفە ف شکوفه.

**شل:** ۱) سست؛ ۲) تەڕ؛ ۳) تراو؛ ۴) کوتـانی زۆر بۆ شتی نمدار: (**شل** بیکـوتەو لەسەر برینە کەی دانێ، **شل‌شل** کوتایانم)؛ ۵) گەورەتر لە ئەنـدازە: (بەپام **شلە**) ف ۱) سست؛ ۲) خیس؛ ۳) آبکی؛ ۴) بسیار کوبیدن چیز نمدار؛ ۵) گشادتر از اندازهٔ لازم.

**شڵ:** ۱) سوُری کاڵی پنۆك پنۆك: (گای **شڵ**)؛ ۲) بەڵەکی سوُر و سپی ف ۱) قرمز مات و روشن با خالهای سفید؛ ۲) ابلق سرخ و سفید.

**شڵاپ:** دەنگی ئاو کە شتێکی تێ دەکەوێ ف صدای آب که چیزی در آن افتد.

**شڵاڵ:** ڕیزە دروُمان لە سەرەوە ف زنجیرهٔ بخیهٔ پدیدار، شلالدوزی.

**شڵاڵە:** شیرازەی کتێب ف شیرازهٔ کتاب.

**شڵانە:** زەردالو، قەیسی ف زردالو.

**شڵانە کوت:** لەتکەقەیسی، قەیسی وشك ف برگه زردالو.

**شڵانی:** شڵانە ف زردالو.

**شلبوُن:** ۱) سست بوُن؛ ۲) ماندوُ بوُن؛ ۳) تەڕبوُن ف ۱) سست شدن؛ ۲) خسته شدن؛ ۳) خیس شدن.

**شلبـوُنەوە:** ۱) لە پێچ خاوبوُنەوە؛ ۲) لەتیریەوە تراوبوُن ف ۱) از پیچ خوردن برگشتن؛ ۲) از غلظت به آبکی تبدیل شدن.

**شلّپ:** ۱) شڵاپ؛ ۲) پڕی دەست لە ئاو: (**شلّپێ** بە دەم‌و چاوت دادە) ف

ناخوانا.

**شەڕە پۆپان:** چنگە پرچەی ژنان ف جدال زنانە.

**شەڕەپۆپە:** چنگەپرچە ف گیس همدیگر را کشیدن.

**شەرەت:** ئاوارەو رەبەن، دەربەدەر ف آوارە و بی‌نام و نشان.

**شەڕەتۆپ:** ١) شەڕ بە تۆپی چەك؛ ٢) گەمەی تۆپەڵەبەفر ف ١) جنگ توپخانە؛ ٢) بازی با گلولە برف.

**شەڕەتۆپەڵ:** گەمەی تۆپەڵەبەفر ف بازی با گلولە برف.

**شەڕەجنێو:** جوێن پێکدان ف دشنام بهم دادن.

**شەڕەجوێن:** شەڕەجنێو ف دشنام بهم دادن.

**شەڕەچەقۆ:** بەچەقۆ بەشەڕهاتن ف جنگ با چاقو.

**شەڕەچەقە:** بە دەنگی بەرز لە یەکتر تووڕەبوون ف نزاع لفظی با صدای بلند.

**شەڕەخەنجەر:** بەخەنجەر لێکدان ف جنگ با خنجر.

**شەڕەدندوك:** بە بۆڵەو پرتە دەگژیەك ڕاچوون ف جدال لفظی با غرولند.

**شەڕەدندوکە:** شەڕە دندوك ف نگا: شەڕەدندوك.

**شەڕەدەنوکە:** شەڕەدندوك ف نگا: شەڕەدندوك.

**شەڕە زیڕینگەرانە:** لە دوورەوە قسەبە یەکتر گوتن ف جنگ زرگرانە.

**شەڕە ژن:** بەشەڕهاتنی ژنان پێکەوە ف جنگ میان زنان.

**شەڕەسە:** بەشەڕهاتنی سەگان ف جنگ سگها.

**شەڕەسەگ:** بەشەڕهاتنی سەگان ف جنگ سگان.

**شەڕەشۆق:** بەسەر دەیەکترهەڵدانی حەیوان ف شاخ بەشاخ شدن حیوان.

**شەڕەشەق:** ١) بەپا لەیەکتردان؛ ٢) بریتی لە دنیای پڕ لە ئاژاوەو تێکەڵ پێکەڵی ف ١) جنگ با لگد؛ ٢) کنایە از آشوب و درهم برهمی.

**شەرەف:** ئابڕوو ف شرف.

**شەڕەقۆچ:** شەڕە شۆق ف شاخ بە شاخ شدن حیوان.

**شەڕەقۆچەقانی:** شەڕ بە بەرەقانی ف جنگ با فلاخن.

**شەڕەکەڵ:** لێکدانی دو کەڵ، بەشەڕهاتنی کەڵان ف جنگ گاومیشهای نر.

**شەڕەکەڵەباب:** لێکدانی دوکەڵەباب ف جنگ خروس.

**شەڕەگ:** شادەمار، شاڕەگ ف شاهرگ.

**شەڕەگەڕەك:** پەقچوونی دوتاخ ف جنگ میان دو محلە.

**شەڕەنگێز:** جنگن، ئاژاوەچی ف فتنەانگیز.

**شەڕهۆمللێ:** چەقەو شەڕو هەرا ف جار و جنجال.

**شەریح:** گۆشتی نەرمەی بێ پێشە ف گوشت بی‌استخوان.

**شەریف:** ١) خاوەن ئابڕوو؛ ٢) ناوە بۆ پیاوان ف ١) شریف؛ ٢) نام مردانە.

**شەریفا:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان کە توسط بعثیان ویران شد.

**شەریك:** ١) هەواڵ، هاوڕێ؛ ٢) هاوبەش لە ماڵدا ف ١) دوست، رفیق؛ ٢) شریك در سرمایە.

**شەریکە:** بنکەی هاوبەشی لە بازرگانیدا ف شرکت تجارتی.

**شەریکەدز:** دەسکیس، دایکەدزە ف دزد افشار.

**شەز:** قڕنو، چنگنە ف نوعی کنە.

**شەس:** ١) هەست، هۆش؛ ٢) ڕێژنەبارانی توند، ڕەهێڵە؛ ٣) جەنگەی بارانی بەهار؛ ٤) قامکە گەورە، تلیامەزن؛ ٥) ژمارەی دوای پەنجا و نۆ ف ١) هوش، حس؛ ٢) رگبار تند؛ ٣) موسم بارانهای بهاری؛ ٤) انگشت شست؛ ٥) عدد شصت.

**شەس بێدار:** بەئاگا، ئاگادار ف هشیار، باخبر.

**شەسپەڕ:** گوڵێکە ف گلی است.

**شەست:** شەس ف نگا: شەس.

**شەستپەڕ:** شەسپەڕ ف نگا: شەسپەڕ.

**شەستکردن:** بارینی بە ڕێژنە ف بارش تند.

**شەستە:** ١) جەنگەی بارانی بەهاری؛ ٢) خەت‌دانی زەوی بۆ توتن چەقاندن ف ١) موسم بارانهای بهاری؛ ٢) شیار زدن زمین برای کشت توتون.

**شەستەباران:** ١) جەنگەی بارانی بەهار؛ ٢) ڕێژنەی توند ف ١) موسم باران بهاری؛ ٢) رگبار تند.

**شەستەرەهێڵە:** ڕێژنە بارانی توند: (جاران دە ڕۆژ بە هەچچەهەچەو بارەبەریەوە / **شەستەرەهێڵە** لیزمەو و بارانو تەڕیەوە) «پیرەمێرد» ف رگبار تند باران.

**شەستەکردن:** ١) بارینی بە ڕێژنە؛ ٢) خەت دانی زەوی بۆ توتن چەقاندن ف ١) بارش رگبار؛ ٢) شیار زدن زمین برای کشت توتون.

**شەستەم:** ژمارەی دوای پەنجاونۆیەم ف شصتم.

**شەستەمین:** شەستەم ف شصتم.

**شەستەهەمین:** شەستەم ف شصتم.

**شەستیر:** ڕەشاش، موسەلسەل، ئاگربار، مەترەلۆز ف آتشبار، مسلسل.

**شەسکردن:** شەست کردن ف نگا: شەست کردن.

**شەش:** ژمارەی دوای پەنج ف عدد شش.

**شەش ئاگر:** جۆرێ دەمانچە ف کلت ششلول.

**شەش ئالی:** شەش لا ف شش جهت.

**شەشا:** شەشەم، دوای پێنجەم ف ششم.

**شەشار:** شەش‌ئاگر، جۆرێ دەمانچە ف نوعی تپانچە.

**شەشان:** شاشان، ناوی ژنانە ف نام زنانە.

**شەش‌بەند:** گای نۆساڵە ف گاو نەسالە.

**شەشبەندی:** فێڵ بازو گزیکار، حیلەباز ف ناروزن و حیلەگر.

**شەشپاڵو:** شەش گۆشە ف مسدّس، شش گوشە.

**شەشپەڕ:** ١) جۆرێ تۆمی جۆ؛ ٢) گیایەکی زۆر شینەو زۆرتر لە گۆڕستانی دەنێژن ف ١) نوعی جو؛ ٢) گل شصت پَر.

**شەش‌ترنگە:** چێشتێکە ف آشی است.

**شەشخان:** جۆرێ تفەنگ ف نوعی تفنگ.

**شەشخانە:** شەشخان ف نوعی تفنگ.

**شەشدانگ:** ١) تێکڕایی مڵك؛ ٢) ئێستری پشت پانو چوارپەل قەوی ف ١) شش دانگ ملك؛ ٢) استر قوی و تنومند.

**شەشدەر:** ١) شەش ئالی، پێش و پاش و سەرو ژێر و ڕاست و چەپ؛ ٢) جێگەی بازی مۆرەی شەش خاڵ لە نەردیندا: (شەشدەرم گیراوە مەشغوڵم بە دەستی نەردەوە) «تاهیر بەگ» ف ١) شش جهت، جهات ششگانە؛ ٢) ششدر نرد.

**شەش دەرب:** شەشار، جۆرێ دەمانچە ف نوعی تپانچە.

**شەشـك:** ١) لە ڕۆژی دوهـەمی مانگی دوای ڕەمەزانەوە تا حەوتەم؛ ٢) شاشك، مێزەر، سەروپێچ؛ ٣) ناوی گوندێکە ف ١) از دوم تا هفتم ماه شوّال؛ ٢) دستار؛ ٣) نام دهی است.

**شەشکان:** شەشکی دوای ڕەمەزان ف شش روز بعداز عیدفطر.

**شەش کلك:** کەسێ کە شەش تلی لە دەستی هەیە ف کسی کە انگشت انگل دارد.

**شەشکێ:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان کە توسط بعثیان ویران شد.

**شەشگـۆشە:** شەشپاڵو، خەتێ کە بە شەش جێ شکابێ و سەری وێك کەوتبێ ف شش ضلعی.

**شەش لا:** شەش ئالی، شەشدەر ف شش جهت.

**شەشلە:** دوازدە ڕۆژ لە چلەی زستان لە چوارەوە تا شازدە ف از چهارم تا شانزدهم بهمن ماه.

**شەشـۆ:** ١) شەش کلك، شەش قامك؛ ٢) ناوی گوندێکە ف ١) شش انگشت، دارای انگشت انگل؛ ٢) نام دهی است.

**شەشە:** شەش کلك ف شش انگشت.

**شەشەك:** ١) شەش کلك؛ ٢) شەشکان ف ١) شش انگشت؛ ٢) شش روز پس از عید فطر.

**شەشەکان:** ١) مانگی دوای ڕەمەزان؛ ٢) شەشکان ف ١) ماه شوّال؛ ٢) شش روز بعد از عید فطر.

**شەشەلان:** شەشەکان ف نگا: شەشەکان.

**شەشەم:** دوای پێنجەم ف ششم.

**شەشەمین:** دوای پێنجەمین ف ششمی.

**شەشهەمین:** شەشەمین ف ششمی.

**شەشەیی:** جنۆکەی ساواکوژ ف جنّ نوزادکش، آل.

**شەشیەك:** لەشەش پاژ پاژێك ف يك ششم.

**شەشیەکی:** شەشیەك لە کەلەپوور ف يك ششم مردەریگ.

**شەعر:** دەسرۆکەی حەریری سەرپێچی ژن و پیاوان ف سرپوش حریر مردانە و زنانە.

**شەعموز:** چەمووش ف چموش.

**شەعن:** بزنی بەڵەك ف بزخلنگ.

**شەعـەل:** گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدۀ کردستان توسط بعثیان.

**شەغرە:** شخرە، شغرە ف نگا: شخرە.

**شەغرە کێش:** شخرە کێش ف نگا: شخرە کێش.

**شەف:** بەرانبەری ڕۆژ، دەمی تاریکایی ف شب.

**شەفت:** چەفت بڕیاو ف کج بریدە.

**شەفتا:** تای شەو، نۆبەتێ لە شەودا ف تب شبانە.

**شەفتاری:** شەفی تاریك و بێ تریفەی تاف هەیف ف شب تاريك، دیجور.

**شەفتالو:** خۆخ ف شفتالو، هلو.

**شەفتالی:** شەفتالو ف شفتالو.

**شەفتر:** پیرێ شەف ف پریشب.

**شەفتوور:** چەفت بڕیاگ، شەفت ف اریب، کج بریدە.

**شەفتوول:** شەفتوور ف اریب.

**شەفتەلی:** هەشتاڵو، جۆرێ قۆخە ف شفتالو.

**شەفتی:** بڕیانی چەفت ف کجی در بریدگی.

**شەفەلاح:** ١) بەری دارێکی دەوەنە، بەری داری کفر؛ ٢) مەلێکە ف ١) ثمر درختچەای است؛ ٢) پرندەای است.

**شەفـەلـە:** ١) بەری داری کفـر، شەفـەلاح؛ ٢) مارچێوە ف ١) ثمـر درختچەایست؛ ٢) مارچوبە.

**شەڤ:** ١) شەف، دەمی تاریکی؛ ٢) لار، چەوت، خوارەوەبـووگ ف ١) شب؛ ٢) خمیدە، کج.

**شەڤارە:** ١) خەڵفی تازەو شلك و تێراو؛ ٢) زۆر درێژ ف ١) جوانۀ شاداب و ترد؛ ٢) بسیار بلند قد.

**شەڤارە:** ڕاوی مەل لە شەودا بە چرا ف شکار پرندە در تاریکی با چراغ.

**شەڤانە:** ١) لەشەودا؛ ٢) کرێی ئێشك گرتنی حەسەس؛ ٣) هۆندنەوەی شیعر ف ١) شب هنگام؛ ٢) مُزد عَسس؛ ٣) سرودن شعر.

**شەڤ بشکێك:** گیایەکە بە شەو گوڵ دەکاو بە ڕۆژ دەپوچێتەوە ف گلی کە در شب می‌شکفد، نیلوفر.

**شەڤ بۆری:** شەو ڕابواردن لە شوێنێکی جگە لە ماڵەخۆ ف شب نشینی.

**شەڤ بێهن:** گوڵێکە بەشەو بۆنی هەیەو لە شەوبۆ جگەیە ف گُلی است.

**شەڤ پەست:** مۆتە، مۆتەکە ف کابوس.

**شەڤتا:** شەفتا ف تب شبانە.

**شەڤتاری:** شەفتاری، تاریکە شەو ف شب تاريك.

**شەڤخشت:** تروزی درێژو ئەستور بۆ تۆم، کالیار ف خیار چنبر بزرگ.

**شەڤخشك:** شەڤخشت ف خیار چنبر بزرگ.

**شەڤخوونی:** شەبەیخوون، پەلاماری شەوانە ف شبیخون.

**شەڤدەر:** ١) مرۆ یان ئاژەڵێ کە شەو نایەتەوە ئاوایی؛ ٢) شەبدەر ف ١) انسان یا حیوانی کە شب در صحراست؛ ٢) گیاه شبدر.

**شەڤرۆ:** کەسێ بە شەف سەفەر دەکا ف شبرو.

**شەڤرۆنك:** ١) جێژنێکی یەزیدیەکانە؛ ٢) بشەف لدورا هەڤدی کوم بوون ف ١) یکی از جشنهای مذهبی یزیدیان؛ ٢) شب نشینی.

**شەڤرەش:** شەفتاری، تاریکە شەو ف شب تاريك.

**شەڤـرەشـك:** ١) خەیاڵات، لێکدانەوەی بێ بەهرە؛ ٢) نەخوشیەکی مریشکە پێ کوێر دەبن ف ١) اوهام، خیالات؛ ٢) از بیماریهای مرغ خانگی.

**شەڤرەڤك:** چەك چەکی ف شب پرە.

**شەڤرەڤیك:** چەکچەکی، چەکچەکیلە ف شب پره، خفاش.
**شەڤرەڤین:** شەڤرەڤیك ف خفاش.
**شەڤرەڤینك:** ۱) شەڤرۆنك، شەڤ لدۆرا هەڤ کۆم بوون؛ ۲) چەك چەکی ف ۱) شب نشینی؛ ۲) شب پره.
**شەڤرەوین:** چەکچەکی ف خفاش.
**شەڤشەڤۆك:** چەکچەکی ف خفاش.
**شەڤکری:** کاری شەوانە، شول کرن بشەڤ ف کارشبانه.
**شەڤکۆر:** ۱) کەسێ کە بە شەو نابینێ؛ ۲) چەکچەکی ف ۱) شبکور؛ ۲) خفاش.
**شەڤگور:** بومەلێڵە، بوڵێڵە، سوزو ف گرگ و میش اول بامداد.
**شەڤگـەڕ:** ۱) ئێشـك چی شەوانە؛ ۲) بریتی لە پیاوی ئازا؛ ۳) جۆرێ مارمێلکەی ماڵی؛ ۴) کەسێ کە لە خەودا ئەگەڕێ و لەناو جێگە نامێنێ ف ۱) نگهبـان شب؛ ۲) کنـایه از آدم شجـاع؛ ۳) نوعی مارمـولك خانگی؛ ۴) کسی که درخواب راه می‌رود.
**شەڤگەش:** گوڵێکە هەر لەشەودا دەپشکوێ و بەرۆژ دەپوچێتەوە ف گلی است.
**شەڤگێڕ:** شەڤگەڕ ف نگا: شەڤگەڕ.
**شەڤنم:** ئاونگ، تنۆکەئاوی سەر گیا لە پێش ئاوهەڵاتندا ف شبنم.
**شەڤنەم:** شەڤنم ف شبنم.
**شەڤۆك:** ئەوباڵدارانەی شەو ناخەون. وەك *کوندو توتاك و گوین و*... ف پرندگان شب بیدار.
**شەڤە:** ۱) شەشەیی، جنۆکەی ساواخنکێن؛ ۲) بەردێکی رەشی بەنرخە ف ۱) جن نوزاد کش، آل؛ ۲) شبه.
**شەڤەرۆك:** زبارەی ساوارکوتان ف بلغور کوبی تعاونی.
**شەڤهەری:** شەونشینی ف شب نشینی.
**شەڤی:** ۱) چێشت و نانێ کە لە شەڤ ماوەتەوە، بەیات؛ ۲) خوارەوەبو، چەماو؛ ۳) چەراندنی ئاژەڵ لە شەودا؛ ۴) جێگەی پشوودانی ئاژەڵ لە شەودا ف ۱) شب مانده، بائت؛ ۲) خمیده؛ ۳) چرانیدن گله در شب؛ ۴) جای آسایش گله در شب.
**شەڤین:** ۱) چەڕانی ئاژەڵ لە شەڤـدا؛ ۲) جێگـەی پشوودانی ئاژەڵ لە شەودا؛ ۳) چەماوە، خوارە و بوگ؛ ۴) رەش وەك شەو ف ۱) چریدن گله در شب؛ ۲) جای آسـودن گله در شب؛ ۳) خمیده؛ ۴) بەرنـگ شب، سیاه.
**شەق:** ۱) شاق، لێدان بە پشتی پێ؛ ۲) زللە؛ ۳) گۆچانی گۆبازی؛ ۴) شڕ، نارەحەت: (حاڵم **شەقە**)؛ ۵) تورت و تیراو؛ ۶) لە خەت دەرچوونی گاجوت؛ ۷) دەفەی جۆڵایی؛ ۸) دەرز، تلیش؛ ۹) رەپ و راست؛ ۱۰) تێك شکاوی سست؛ ۱۱) داری بن باخەڵی شەل؛ ۱۲) زل و بەرین: (**شـەقە** جۆگە)؛ ۱۳) ناوەڕاست: (شەوگار **شەق** بو)؛ ۱۴) سەخت و رەق: (کەللە **شەقە**) ف ۱) تیپا؛ ۲) سیلی؛ ۳) چوگان گوی بازی؛ ۴) پریشان و دشوار؛ ۵) ترد و شاداب؛ ۶) انحراف گاو از خط شخم؛ ۷) یکی از ابزار بافندگی؛ ۸) شکاف؛ ۹) رك و صریح؛ ۱۰) درهم شکسته و سست؛ ۱۱) چوب زیر بغـل شل؛ ۱۲) بزرگ و پهن؛ ۱۳) وسط؛ ۱۴) سخت و سفت.
**شەقار:** ۱) لەت، دڕاو؛ ۲) شوێن و لەلە ف ۱) پاره و دریده ؛ ۲) شیار.
**شەقارشەقار:** بزڕ بزڕ، لەت لەت ف پاره پاره.
**شەقازللە:** زللە ف سیلی.
**شەقازلە:** زللە ف سیلی.
**شەقاشەق:** ئێر و ئەوێ ف اینور و آنور.
**شەقافلوس:** نەخۆشی خورە ف بیماری خوره، آکله.
**شەقال:** پێلاوی سەر بە مو چندراو ف چارغ، چارق.
**شەقام:** ۱) جادە، شۆسە؛ ۲) زللە؛ ۳) هەنگاو ف ۱) جاده، شاهراه؛ ۲) سیلی؛ ۳) گام.
**شەقان:** گەمەی گۆبازی ف گوی و چوگان بازی.
**شەقاندن:** رکە، کێ بەرکێ لە غاردان‌دا ف مسابقهٔ دو.
**شەقـانێ:** ۱) شەپ شەپان؛ ۲) شەپانێ؛ ۳) گۆو گۆچان بازی ف ۱) لگدبازی؛ ۲) توپ بازی با پا؛ ۳) چوگان بازی.
**شەقانشەق:** سەرانسەر، لەم سەر تا ئەو سەر ف پیوسته، سراسر.
**شەقاو:** ۱) هەنگاوی زل؛ ۲) ریگەی خۆشکراو، شەقام ف ۱) گام بلند؛ ۲) راه هموار شده، جاده.
**شەقاوشەق:** شەپ شەپان ف با لگد بەهمدیگر زدن، لگدبازی.
**شەقاونان:** هەنگاونان، پاگوێزانەوە لە زەوی ف گام برداشتن، گام نهادن.
**شەقاوهاویشتن:** شەقاونان ف گام برداشتن.
**شەق بردن:** ۱) هەڵ تلیشان، داتلیشان؛ ۲) لەبەریەك چوون؛ ۳) بریتی لە تووڕەبوونی زۆر: (لە داخی تۆ **شەقم برد**) ف ۱) شکافتن، ترك برداشتن؛ ۲) از هم وا رفتن؛ ۳) کنایه از خشمناکی بسیار.
**شەقتاندن:** بەدرێژایی لەت کردنی دار ف دو نیم کردن چوب از طول.
**شەقتین:** رۆشان، دارۆشان ف خراشیدن.
**شەق تێهەڵدان:** شەپ تێهەڵدان ف تیپازدن.
**شەق‌شەق:** ۱) دەنـگی ددان وێك کەوتن؛ ۲) زۆر تورت و تێراو ف ۱) صدای بهم خوردن دندانها؛ ۲) بسیار ترد و شاداب.
**شەق شەقان:** شەپ شەپان ف نگا: شەپ شەپان.
**شەق شەقانێ:** شەپ شەپانێ ف نگا: شەپ شەپانێ.
**شەق شەقە:** خڕخاشە، جغجغە ف جغجغه اسباب بازی.
**شەق شەقێن:** شەپ شەپێن ف لگدبازی.
**شەق کردن:** ۱) دولەت کردن؛ ۲) چەند پارچە کردن ف ۱) دو نیم کردن؛ ۲) چند پاره کردن.
**شەقڵ:** ۱) شقڵ؛ ۲) چاپ ف ۱) مُهر چوبی خرمن؛ ۲) چاپ.
**شەقـڵاوە:** شاروکێکی هاوینـەهەوارە لە کوردستان، بەعسی چەندجار بومبارانی کردوە ف از شهرهای ییلاقی کردستان.
**شەقڵ شکان:** مۆر لەسەر لاچوون ف لاك و مهر شکسته شدن.
**شەقـڵ شکاندن:** ۱) مۆر لە سەر ماڵینەوە؛ ۲) بریتی لە لەپێش خەڵکا دەست بەکـار کردن؛ ۳) بریتی لە ئابـڕوو بردن ف ۱) مهـر از سر برداشتن؛ ۲) کنایه از قبل از دیگران اقدام کردن؛ ۳) کنایه از آبرو بردن.

**شەقڵ کردن:** مۆر کردنی خەرمان [ف] مهر چو بین به خرمن زدن.

**شەقڵە:** شەقڵ [ف] مهر چو بین خرمن.

**شەقوبانێ:** گۆبازی [ف] چوگان بازی.

**شەق و پەق:** لەت‌و کوت، پارچە پارچە [ف] لت و پار.

**شەق و شڕ:** ۱) تێك چوُی سست و شل که بۆ کورسی‌و شتی دارینی دەڵین؛ ۲) حاڵ خراپ [ف] ۱) نامحکم و سست که برای ابزار چوبین گفته می‌شود؛ ۲) پریشان حال.

**شەق و شۆق:** ۱) شەق و پەق؛ ۲) تەقەتەق [ف] ۱) لت و پار؛ ۲) سرو صدای بسیار.

**شەقوق:** جۆرێ دارەبەن که قەزوانی خراپ دەگرێ [ف] نوعی بوتهٔ درخت.

**شەقۆق:** سوُچ و قوژبن، گۆشەو کەنار [ف] گوشه و کنار.

**شەقۆن:** به سەر تێهەڵدانی حەیوان. شاخ لێ دان [ف] شاخ زدن حیوان.

**شەقوهۆڕ:** دەنگی زۆری شکان [ف] صدای شکستن زیاد.

**شەقە:** ۱) دەنگی باڵ لە فڕیندا؛ ۲) دەنگی به ردە فڕکەی بە قۆچەقانی؛ ۳) نیوەی توێڵ‌و سەر؛ ۴) مشاری دوکەسی؛ ۵) کۆتەرەی بنەمێو؛ ۶) نیو لاشە گۆشت؛ ۷) لە سەرەوە بە نیوەیی دادڕاو؛ ۸) تەقینی تەڵەو...؛ ۹) داری بن هەنــگــڵی شەل [ف] ۱) صدای بال در حین پرواز؛ ۲) صدای فلاخن هنگـام سنـگ پرانی؛ ۳) شقیقـه، نیمـهٔ سر؛ ۴) ارهٔ دونفره؛ ۵) تنهٔ تاك؛ ۶) شقهٔ گوشت؛ ۷) از بالا به دو نیم شکافته؛ ۸) صدای بهم آمدن تله؛ ۹) چوب زیر بغل شل.

**شەقەبەقە:** پارچە پارچە، کوت کوت [ف] قطعه قطعه.

**شەقەبەند:** ۱) نوشتەی سەرێشەی نیوەیی؛ ۲) رەخت‌و نەسپابی زین [ف] ۱) دعای شقیقه؛ ۲) یراق زین.

**شەقەتەل:** تۆپی لە پەڕۆ چندراو بۆ تۆپێن [ف] توپ از پارچه ساخته شده برای بازی.

**شەقەتەلانی:** گەمەی تۆپەڕاکردن [ف] توپ‌بازی.

**شەقەجۆ:** جۆباری گەورە کەئاوی هەمیشەوزۆرە [ف] جو یبار پُرآب.

**شەقەجۆگە:** شەقەجۆ [ف] جو یبار پُرآب.

**شەقەزللە:** زللە [ف] سیلی.

**شەقەشەق:** دەنگی زۆری ددان‌و باڵ‌و بەردی قۆچەقانی‌و... [ف] صدای پیاپی دندان وبال و فلاخن و...

**شەقە کردن:** دولەت کردن [ف] دونیم کردن.

**شەقە کێش:** کەسێ کە مشاری زل بەکار دێنێ [ف] اره کش.

**شەقــە گل:** چاوێشەیێ کە سەری پێوە ژان دەکا [ف] چشم‌درد سخت که سردرد آورد.

**شەقەل:** باری بارەبەرێك لەگیا، شەغرە [ف] یك بار باربر از گیاه.

**شەقەلۆر:** جۆرێ داری لێرەوارە [ف] نوعی درخت جنگلی است.

**شەقەمشار:** هەڕەی دوکەسی، شەقە [ف] ارهٔ دونفره.

**شەقەمێو:** کۆتەرەرەز [ف] تنهٔ تاك.

**شەقــەی باڵ:** برێتی لە فڕینی بەپــەلــەی باڵــدار: (کــەوتــەخۆ دای لە شەقەی باڵ دیسا) «هەژار» [ف] کنایه ازبال‌زدن سریع پرنده.

**شەقی:** ۱) ماندوُ، خەستە، مانْگ؛ ۲) نەشقی، یاخی [ف] ۱) خسته؛ ۲) متمرّد.

**شەقیلە:** ۱) چەرمی زۆر تەنك‌و سوُك کە دەکرێتە هەمانە؛ ۲) بەرەڵبێنەی چەرمینی ژنــان لە کاتی تەشی‌رستنا [ف] ۱) چرم نازك که از آن انبان سازند؛ ۲) پیش‌بند چرمین ویژهٔ دوك‌ریسی.

**شەقین:** ۱) جریوەی مەلیچــك؛ ۲) ملە ورکــەبەری، کێ‌بەرکێ [ف] ۱) صدای گنجشك؛ ۲) مسابقه.

**شەقێن:** گۆبازی [ف] چوگان‌بازی.

**شەك:** ۱) گۆچــانی گۆیێن؛ ۲) چك، قوُڵایی زگی جك؛ ۳) بەرخی دو بەهــار دیتــو؛ ۴) جگ کە باری لوُسی بکەوێتە سەر عەرز؛ ۵) چۆك، ئەژنۆ؛ ۶) لەرەی ئاوی چەم [ف] ۱) چوگان گوی‌بازی؛ ۲) طرف گود شتالنگ؛ ۳) شیشك، برهٔ دوبهاردیده؛ ۴) شتالنگی که برکنارهٔ صاف ایستد؛ ۵) زانو؛ ۶) حرکت و لرزش آب رودخانه.

**شەکار:** چیمەن‌و گیاجاڕ [ف] چمن.

**شەکال:** شەقال [ف] پالیك، چارق.

**شەکان:** ۱) لەرین لە بەر با؛ ۲) بازی گۆیێن [ف] ۱) جنبیدن از باد؛ ۲) گوی‌بازی.

**شەکاندن:** لەراندنی با لکەدارو ئاڵاو... [ف] جنبانید باد شاخه یا پرچم یا چیز دیگری را.

**شەکاندنەوە:** شەکاندن [ف] نگا: شەکاندن.

**شەکانن:** شەکاندن [ف] نگا: شەکاندن.

**شەکانەوە:** لەرین لە بەر با [ف] جنبیدن از باد.

**شەکبەران:** شەکی نێری سێ‌بەهارە [ف] شیشك نر سه‌بهاره.

**شەکر:** گەزۆی چیتك‌و شیلەی چۆنەری وشکەوەکراو [ف] شکر.

**شەکــرا:** گونــدێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد [ف] نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**شەکــران:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد [ف] نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**شەکرانێ:** گــوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد [ف] نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**شەکراو:** خۆشاوی شەکر [ف] شکراب.

**شەکراوخواردنەوە:** کۆڕی ژن‌مارەکردن [ف] کنایه از مجلس عقد و بله‌بران.

**شەکرپەنیر:** هەڵوایەکە لە شەکر و ئاردەبرنج دەکرێ [ف] شکرپنیر.

**شەکرخواردن:** برێتی لە قسەی باش کردن [ف] کنایه‌از سخن نیکوگفتن.

**شەکرخەنە:** بزەی بە خۆشی [ف] شکرخند.

**شەکردان:** دەفری شەکرتێ کردن [ف] ظرف شکر.

**شەکرشکاندن:** ۱) شەکری رەق‌هەڵاتو وردکردن؛ ۲) برێتی لە قسەی خۆش کردن [ف] ۱) شکرخرد کردن؛ ۲) کنایه از سخن نیکوگفتن.

**شەکرشکێن:** چەکوشی شەکرشکاندن [ف] چکش قندشکن.

**شەکرلەمە:** جۆرەنانێکی زۆر ناسك‌و شیرینە [ف] نوعی نان شیرینی.

**شەکرلێڤ:** گفت‌ولفت خۆش، قسە شیرین [ف] خوش سخن.

**شه‌کرلیو:** شه‌کرلیف ف خوش بیان.
**شه‌کرمز:** نه‌خوشی شه‌کر ف مرض قند.
**شه‌کـروك:** ۱)وشکه‌وه‌بوی شیله‌ی گیایه‌که تامی شیرینه؛ ۲) گیایه‌کی سه‌رخری درکاویه خریك له بن درکه‌کانی‌دا هه‌یه ده‌یخون، که‌رته‌شی؛ ۳) جوری گنـدوره ف ۱) خشکیدهٔ گیاهی است شیرین مزه؛ ۲) گیاهی است خاردار؛ ۳) نوعی خربزه.
**شه‌کروکه:** ۱) شه‌کروك؛ ۲) شیرنیات ف ۱) نگا: شه‌کروك؛ ۲) آب‌نبات.
**شه‌کـره:** ۱) شه‌کـروکـه؛ ۲) گوینی جه‌باری، گوینیه‌زه‌رده ف ۱) نگا: شه‌کروکه؛ ۲) گون کتیرا.
**شه‌کره‌باوی:** چه‌قاله‌بادامی شیرن ف چغاله‌بادام شیرین.
**شه‌کره‌پیاو:** پیاوی به‌ئاکارو بێ‌عه‌یب ف سره‌مرد، مردنیکوکار و خوب.
**شه‌کره‌ژن:** ژنی باش‌و به‌حورمه‌ت ف زن خوشخوی و کدبانوی خوب.
**شه‌کره‌سیو:** جوری سیوی چکوله‌ی سپی ف سیب قندی.
**شه‌کس‌پا:** گوندیکی کوردستانه به‌عسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.
**شه‌کشه‌کان:** شه‌کانه‌وه ف جنبیدن از باد.
**شه‌ك‌مه‌ر:** په‌زی که یه‌که‌م‌جار زاوه ف گوسفندی که یکبار زاییده.
**شه‌کو:** له‌رین، له‌رینه‌وه ف جنبیدن، تکان سبك.
**شه‌کو:** داری دریژ بو ئاوئاژن‌کردن یان گویزته‌کاندن ف چوب بلند برای آبیاری یا گردوچینی.
**شه‌کوك:** جوری هه‌رمی ف نوعی گلابی.
**شه‌که:** ۱) میچکه‌به‌رازی یه‌کساله؛ ۲) کلاوی پیسته‌مه‌ر؛ ۳) شه‌کان ف ۱) ماده گراز یکساله؛ ۲) کلاه‌پوستین؛ ۳) جنبش از باد.
**شه‌که‌ت:** ماندو، خه‌سته، شه‌قی ف خسته.
**شه‌که‌تی:** ماندوه‌تی زور ف خستگی زیاد.
**شه‌که‌ر:** ۱) شه‌کر؛ ۲) به‌شانه‌که‌ر، مولەشانه‌ده‌ر ف ۱) شکر؛ ۲) شانه‌زن.
**شه‌که‌رات:** نوقل، نوغل، شه‌کروکه ف نقل، شیرینی، آب نبات.
**شه‌که‌ربادام:** جوری هه‌لوا ف نوعی شیرینی.
**شه‌که‌ربوره:** جوری شیرنیات ف نوعی شیرینی.
**شه‌که‌رپه‌نیر:** شه‌کرپه‌نیر ف شکرپنیر.
**شه‌که‌رخه‌ن:** شه‌کرخه‌ن ف شکرخند.
**شه‌که‌رگری:** گریان له خوشیان ف گریه از شادی، اشك شوق.
**شه‌که‌روك:** شه‌که‌روکه ف نگا: شه‌که‌روکه.
**شه‌کـه‌روکـه:** منالی لوسکه که له به‌زم‌دا سه‌ما ده‌کا ف بچه‌ای که در مجلس بزم می‌رقصد.
**شه‌که‌ری:** سپات، سپی ئامال‌زه‌رد ف کرم‌رنگ.
**شه‌که‌شه‌ك:** ته‌که‌ته‌ك، ویك‌که‌وتنی شوره‌وه‌بو ف بهم‌خوردن فروهشته.
**شه‌که‌مه‌ر:** شه‌کمه‌ر ف گوسفند یکبار زائیده.
**شه‌که‌می:** به‌رخه‌میوی دوبه‌هاردیتو ف شیشك مادینه.
**شه‌که‌مینگه:** شه‌که‌می ف شیشك مادینه.
**شه‌که‌نه:** شه‌کان ف جنبیدن یواشکی.
**شه‌که‌نیر:** به‌رخی نیری دوبه‌هاردیتو ف شیشك نر.
**شه‌کی:** بریتی له مرویه‌ك که جلکی ناله‌باربێ ف کنایه از شخصی که لباسش نامرتب باشد.
**شه‌کیرت:** جیازی که بوك له‌گه‌ل خویا ده‌یبا بو مال زاوا ف جهیزیه.
**شه‌کی‌کال:** به‌ربـه‌ران، شه‌کی که هیشتـا به‌رانی نه‌گرتـوه ف شیشك آبستن نشده.
**شه‌کیله:** پارچـه‌هـه‌مانه‌ی خوشکراو بو به‌سه‌ر ده‌فر داگرتن ف قطعه انبان دهانه‌بند ظرف.
**شه‌کیلی:** پینه‌چی، پینه‌دوز، مشه‌قه ف پینه‌دوز.
**شه‌کین:** گوبازی ف چوگان‌بازی.
**شه‌گ:** ۱) شه‌ق، گوچـانی گوبـازی؛ ۲) گوبـازی ف ۱) چوگان گوی‌بازی؛ ۲) گوی چوگان بازی.
**شه‌گه:** ۱) شاگا، شاگه، خوش‌به؛ ۲) میچ که میر هاتبێ، جگ که له سه‌ر لاپـانـه‌کـه‌ی ویستـابێ؛ ۳) تاژی له خرتـك چوگ ف ۱) درود؛ ۲) شتالنگ که برکنارهٔ صاف ایستد؛ ۳) تازی که مفصلش ازجا دررفته باشد.
**شه‌گل:** گه‌له‌شه‌ك، میگه‌لی که هه‌موی شه‌ك بێ ف رمهٔ شیشك.
**شه‌گین:** ۱) گوبازی؛ ۲) جوری گه‌مه‌ی جگین ف ۱) چوگان‌بازی؛ ۲) نوعی بازی با شتالنگ.
**شه‌ل:** ۱) له پا سه‌قه‌ت؛ ۲) به‌رەو مافوره‌ی خوارو خیچ؛ ۳) خه‌رار؛ ۴) چینکه؛ ۵) رانك؛ ۶) روت، بێ به‌رگ‌و جل؛ ۷) له‌ت، پاژ ف ۱) لنگ، شل؛ ۲) فرش کج؛ ۳) جوال موبین؛ ۴) نگـا: چینکـه؛ ۵) شلوار پشمی؛ ۶) لخت؛ ۷) قسمت، تکه.
**شه‌لاخ:** ۱) تازیانه، قامچی؛ ۲) زلله ف ۱) شلاق؛ ۲) سیلی.
**شه‌لاخکاری:** به قامچی لیدان ف شلاق‌زدن.
**شه‌لاف:** کلکه‌سوته، مه‌رایی ف تملق، چاپلوسی.
**شه‌لاف کرن:** شالوزی کرن ف تملق‌کردن.
**شه‌لاق:** ۱) قامچی؛ ۲) جوری مه‌زره‌قی بێ تم‌تمه که به زه‌بری لیدان به قامچی به‌ن ده‌یسورینن ف ۱) شلاق؛ ۲) نوعی گردنای بدون نوك آهنی.
**شه‌لاقه:** ۱)شه‌لاق، جوری مه‌زره‌قی بێ تم‌تمه؛ ۲) مه‌لیکی لنگ‌دریژه له ریشوله توزیك زلتره ف ۱) نوعی گردنا؛ ۲) پرنده‌ایست.
**شه‌لال:** ۱) شلال، ریزه‌درومانی ده‌ره‌وه؛ ۲) دریژبون له سه‌ر عه‌رز، سلار؛ ۳) نه‌رم‌و ناسـك؛ ۴) تاڤگه، ئاوهه‌لدیر، سولاف ف ۱) زنجیره بخیهٔ بیرونی، راسته‌دوزی؛ ۲) درازکشیدن روی زمین؛ ۳) نازك و نرم؛ ۴) آبشار.
**شه‌لال:** ۱) تیوه‌دراو، ئاوی: (**شه‌لالی** خوین بوم، له خویندا **شه‌لال** بو)؛ ۲) شلال ف ۱) آغشته؛ ۲) زنجیره بخیهٔ پدیدار.
**شه‌لاله:** شلال ف بخیه‌های بیرونی.
**شه‌لالی:** تیوه‌دراوی، ئاوی، ئالو ف آغشتگی.
**شه‌لان:** ۱) روت‌بونه‌وه، جل له‌به‌رخو داکه‌ندن؛ ۲) چه‌قین؛ ۳) جوری

هەڵپەرکێ ف ۱) لخت شدن، لباس از تن درآوردن؛ ۲) با نوك در جایی گیر کردن و ثابت ماندن؛ ۳) نوعی رقص.

**شەلاندن:** ۱) ڕووت کردن، ڕووت کردنەوە؛ ۲) چەقاندن ف ۱) لخت کردن، لباس از تن کسی درآوردن؛ ۲) با نوك درجایی فروکردن.

**شەلانە:** وەك شەلان ف لنگ مانند، ادای شل درآوردن.

**شەڵانە:** زەردەڵو، قەیسی، مژمژە ف زردالو.

**شەڵانی:** شەڵانە ف زردالو.

**شەلایی:** دەسرەی سرکەیی ف دستمال کلاغی ابریشمی.

**شەلبت:** پڕۆش، چاو لە نەخۆشی کەم‌بینایی ف چشم دردمند کم‌سو.

**شەلبتی:** چاوێ کە تووشی پڕۆشی بوبێ ف چشمی که مبتلا به «شەلبت» باشد.

**شەڵبتی:** ۱) دەنگی ئاو کە بە دەست یان بە سەوڵ لێی دەدرێ؛ ۲) هەڵەنگوتن و کەوتن ف ۱) صدای با دست یا با پاروزدن به آب؛ ۲) سکندری خوردن و افتادن.

**شەلت:** داری باریك و درێژ ف چوب بلند و باریك.

**شەلتە:** شەختە، سەرمای سەختی پاییز ف سرمای سخت نابهنگام پاییز.

**شەڵتە:** ۱) دەرمانی تیر و خەست کە لە سەر برینی دادەنێن؛ ۲) ڕەشکەی کاکێشان؛ ۳) جۆرێ ئاواڵ کراسی ژنانە؛ ۴) بەرگی دۆشەك و باڵشت؛ ۵) شەختە؛ ۶) شڵخەمێش؛ ۷) زوقم؛ ۸) ژێرکراسێکی ژنانەیە بۆ وەختی خەو ف ۱) دوای غلیظ که بر پوست گذارند؛ ۲) تور کاهکشی؛ ۳) نوعی شلوار زنانه؛ ۴) روتختی و روبالشی؛ ۵) سرمای پاییزی؛ ۶) نسل جدید زنبور عسل؛ ۷) سرماریزه، پژ؛ ۸) نوعی لباس خواب زنانه.

**شەڵخە:** شڵخە، پوورە ف نگا: شڵخە.

**شەڵغە:** شڵخە، پوورە ف نگا: شڵخە.

**شەڵغەم:** سەوزیەکە لە تیرەی سلق و چوندەر ف شلغم.

**شەلف:** ۱) ژنی خۆفرۆش؛ ۲) هەڵەنگوتن ف ۱) زن خودفروش؛ ۲) سکندری خوردن.

**شەلفین:** ڕەت بردن و کەفتن ف سکندری خوردن و افتادن.

**شەلق:** ۱) ریپوقی چاو؛ ۲) زینچکاوی برین؛ ۳) تای هەموڕۆژە؛ ۴) میوەو سەوزەی لارزیوی سیس بۆگ؛ ۵) داری بن باڵی پا سەقەت؛ ۶) کرۆسك، جۆرێ هەرمێ کێویە ف ۱) ژفك؛ ۲) چرك وریم زخم؛ ۳) تب روزانه؛ ۴) میوه و سبزی پژمرده و خراب؛ ۵) چوبدستی پاشکسته؛ ۶) نوعی گلابی وحشی.

**شەلقاندن:** ۱) ڕاهێنانی ئەسپ بۆ خۆشڕۆیی؛ ۲) زۆرانەوەی ناوڕان لەبەر زۆر ڕویشتن؛ ۳) بریتی لە لەکوڵ خۆکردنەوە ف ۱) تعلیم اسب؛ ۲) احساس درد و سوزش در ران از فرط خستگی؛ ۳) کنایه از دك کردن.

**شەلقین:** ڕزان و کنخان. بۆ میوەو سەوزی و هیلکە ئێژن ف پوسیدن و فاسد شدن. *برای سبزی و میوه و تخم‌مرغ استعمال دارد.*

**شەلك:** چاروکەی شان و سەرپۆش ف چارقد.

**شەلکە:** نەخۆشیەکی سمی ئاژەڵە ف نوعی بیماری سم دام.

**شەلم:** ۱) پام سەقەتە؛ ۲) شەڵغەم ف ۱) لنگ هستم؛ ۲) شلغم.

**شەڵمان:** گەڕەکێکە لە شاری سنە ف محلّه‌ای در سنندج.

**شەلم کوێرم:** بریتی لە لێدانی بێ ئامانج ف کنایه از زدن بدون هدف.

**شەلمکە:** گیایەکە، سەڵمکە ف گیاهی است خوردنی.

**شەلمە:** گیایەکە لە ناو گەنم دەڕوێ و دەنکەکەی تێکەڵی گەنم دەبێ ف دانه‌ای که در گندمزار روید.

**شەلۆ:** شێلوو، شلوێ ف ولرم.

**شەلوار:** شەڵوار ف نگا: شەڵوار.

**شەڵوار:** ۱) جۆرێ دەرپێی بەگنجی ژنانە؛ ۲) پاتۆڵی پیاوانە ف ۱) شلوار چیندار زنانه؛ ۲) شلوار مردانه.

**شەلوپەت:** لەت و پەت، تەواو دڕاو ف لت وپار.

**شەلوشێت:** گێژ و حۆل، پەتیارە ف خُل، گیج و منگ.

**شەلوف:** ۱) کەڵەشێری خڕکەڵەی چکۆڵە؛ ۲) بیژو، بیچ، پیچ ف ۱) خروس ریزاندام؛ ۲) حرامزاده.

**شەلۆك:** داروکەیەك کە دەموکانەی تێ هەڵدەسوون بۆ ڕاوەمەل ف چوب دبق آلوده که پرنده را بدان شکار کنند.

**شەلۆمك:** شەلۆك ف نگا: شەلۆك.

**شەلە:** ۱) شوێنی هەڵبڕینی جۆگەناو؛ ۲) یەکێ لە ئەستێرەکانی حەوبراله؛ ۳) شەل، پاسەقەت ف ۱) جای بریدن آب از جوی؛ ۲) یکی از ستاره‌های بنات‌النّعش؛ ۳) لنگ، شل.

**شەلەشەل:** ڕۆیشتن بە پای سەقەت ف لنگان لنگان.

**شەلەگە:** جێگەی دادڕینی جۆگە ف جای بریدن آب از جوی.

**شەلەگەڤری:** گیایەکی شیردارە ف گیاهی است.

**شەلەم:** شەڵغەم ف شلغم.

**شەلەمشۆربا:** بریتی لە کاری نازێك و تێکەڵپێکەڵ ف کنایه از درهم برهمی کار.

**شەلەمشۆروا:** شەلەمشۆربا ف نگا: شەلەمشۆربا.

**شەلەمشێوێن:** دارێ کە شەلەمی لە دیزەدا پێ تێك وەردەدەن ف چوب ویژهٔ شلغم بهم‌زدن در دیگ.

**شەلەمە:** ۱) گیایەکە بنکەکەی لە پەتاتە دەکاو زۆر ڕەوانە؛ ۲) سەرپۆشێکە ژنانە ف ۱) گیاهی است مسهل و شبیه سیب‌زمینی؛ ۲) سرپوشی زنانه.

**شەلەمین:** چێشتی ترخێنە ف نوعی آش محلی.

**شەلەمین کەرە:** پشی پایزە ف قاصدك.

**شەلەنگ:** بەلەنجەولار ف خرامان.

**شەلەنگی:** لەنجەولار ف خرام.

**شەلی:** ۱) سپینەدار، شۆخ؛ ۲) ڕووتەوەکراو، جلك لە بەر داماڵدراو؛ ۳) تالان کراو ف ۱) چنار، درخت تبریزی؛ ۲) لخت شده از لباس؛ ۳) غارت شده.

**شەلیای:** ۱) ڕووت کراو بە دەستی چەتە؛ ۲) جل لەبەرخۆ داکەندو؛ ۳) پاسەقەتی ف ۱) غارت شده توسط راهزنان؛ ۲) لخت شده از لباس؛ ۳) لنگی.

**شەلیت:** شریت ف رشتهٔ تابیده.

**شەلّیتە:** ژنی بێ‌شەرم، سەلّیتە ف زن زبان‌دراز.

**شەلیهان:** مۆزەشینە ف نوعی زنبور.

**شەلیك:** شلیك، توی زەوینە ف توت زمینی.

**شەلین:** ۱) ڕووت‌بوونەوە لە جلك‌و شمەك؛ ۲) شەل‌ڕۆیشتن ف ۱) لخت شدن؛ ۲) لنگیدن.

**شەم:** ۱) مۆم؛ ۲) بەرسێبەر؛ ۳) ناوە بۆ ژنان؛ ۴) ڕۆژی دوای هەینی ف ۱) شمع؛ ۲) جای سایه؛ ۳) نام زنانه؛ ۴) شنبه.

**شەما:** ۱)زوونووس؛ ۲) پێش‌نووس؛ ۳) خەت بەسەردا کشاو ف ۱) تندنویس؛ ۲) پیش‌نویس؛ ۳)رویش خط کشیده شده.

**شەماتۆك:** زەوینی خلیسکانێ ف زمین مخصوص سُرخوردن.

**شەماتە:** ۱) کۆمەڵگا، خەلك‌و ئاوایی؛ ۲) چەقەوهەرا، زەنازەنا، قیرەقیر ف ۱) احتماع، مجتمع؛ ۲) جاروجنجال.

**شەمار:** ۱) خزۆك، هەر جانەوەرێ کە بە سەر عەرزدا دەخزێ؛ ۲) هەزارپێ، زیلو ف ۱) خزنده؛ ۲) هزارپا.

**شەمارە:** خزین ف خزیدن.

**شەمارەنگ:** بۆیاخی قۆندەرە، بۆیەی کەوشان ف واکسی.

**شەماق:** زللە، شەقام، شەق، شەپلاخ ف سیلی.

**شەمال:** ۱) مۆمی داگرساندن؛ ۲) تیشکی چراو مۆم ف ۱) شمع؛ ۲) روشنائی شمع و چراغ.

**شەماڵ:** ۱) شەمال؛ ۲) بای باکوور ف ۱) شمع؛ ۲) باد شمال.

**شەماڵ پا:** پەسنی ئەسپی خۆشڕۆیە ف اسب بادپا.

**شەمالك:** مۆمی داگیرساندن ف شمع.

**شەماڵك:** شەمالك ف شمع.

**شەماڵە:** گوێ‌گرتنی ژنان بە شەو لە قسەی خەڵك بۆ بەخت تاقی‌کردنەوە ف فالگوش.

**شەماڵێ:** شەماڵە ف فالگوش.

**شەمام:** ۱) شمام، گندۆرەی پڕ بەمشتی ڕێ‌ڕێ بۆ جوانی و بۆن‌کردن؛ ۲) ناوە بۆ ژنان ف ۱) دستنبو؛ ۲) نام زنانه.

**شەمامۆك:** شەمام ف نگا: شمام.

**شەمامۆکە:** شەمام ف نگا: شمام.

**شەمامە:** ۱) شەمام؛ ۲) گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد ف ۱) نگا: شمام؛ ۲) ازروستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**شەمامەر:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**شەمان:** جێگەی شەم‌تێنان ف شمعدان.

**شەمانی:** گوڵێکە بە زۆررەنگ ف گل شمعدانی.

**شەمبلیلك:** گیایەکە لە ناو دەخڵا دەڕوێ ف گیاهی است در کشتزار روید، شمبلیله.

**شەمبو:** شەم، ڕۆژی دوای هەینی ف شنبه.

**شەمبۆ:** شەم، شەمبو ف شنبه.

**شەمبۆز:** چەمۆش، وڵاخی ڕام‌نەبوگ، جۆتەهاوێژو کازگر ف چموش.

**شەمبە:** شەمبو ف شنبه.

**شەمبەلوت:** شابەڕو، بەڕوەخاسە، کەستانە ف شاه‌بلوط.

**شەمبەلولك:** ۱) گیایەکە؛ ۲) چلوورە، شوشەسەهوڵ ف ۱) گیاهی است؛ ۲) دنگاله.

**شەمبەلیلك:** چلوورە، زەمبەلیلك ف دنگاله.

**شەمبی:** شەمبو ف شنبه.

**شەمت:** خلیسك، جێگای لووسولێز ف لیزگاه.

**شەمتاندن:** خلیسکاندن ف لیزدادن.

**شەمتر:** کاری سەربەخۆی نەزانانە ف کورکورانه، ناآگاهانه.

**شەمتۆك:** ۱) کەسێ کەزۆروازی لەخلیسێنکە؛ ۲) زەوینی خلیسك ف ۱) اسکی‌باز؛ ۲) زمین اسکی.

**شەمتی:** خلیسکاو ف لیزخورده.

**شەمتین:** خلیسکان ف لیزخوردن.

**شەمچك:** گزیکار، حیلەساز، تەڵەکەباز ف مکّار، حیله‌باز.

**شەمچە:** شخاتە، شخارتە، شقارتە ف کبریت.

**شەمخالتك:** جۆرەچەسپێکە لە جۆرێ گیا دەگیرێ ف نوعی چسب گیاهی.

**شەمخین:** ترش بوون لەبەر گەرما ف ترشیدن از گرما.

**شەمدان:** شەمان، جێگەی مۆم ف شمعدان.

**شەمدانی:** شەمانی ف گل شمعدانی.

**شەمدو:** شەمدان ف شمعدان.

**شەمدین:** سوکەلەناوی شمس‌الدّین، ناوە بۆ پیاوان ف مخفّف شمس‌الدّین، نام مردانه.

**شەمدینان:** ناوچەیەکە لە کوردستان ف منطقه‌ای در کردستان.

**شەمڕ:** تۆڕ، بنەمای هاویشتن ف پرت.

**شەمڕاندن:** تۆڕدان، دوورهاویشتن ف پرت کردن، دورانداختن.

**شەمز:** ژاکاوی، سیسی ف پژمردگی.

**شەمزان:** ۱) ژاکان؛ ۲) ڕەنگ‌پەڕین؛ ۳) پەشۆکان ف ۱) پژمردن؛ ۲) رنگ باختن؛ ۳) آشفته‌شدن.

**شەمزاندن:** ژاکاندن ف پژمرده کردن.

**شەمزاو:** ۱) ژاکاو، سیس بوگ؛ ۲) ڕەنگ‌پەڕیو؛ ۳) پەشۆکاو ف ۱) پژمرده؛ ۲) رنگ‌باخته؛ ۳) آشفته و حال بهم خورده.

**شەمزە:** تازەزاوی ئاژەڵ، کارژیلەو بەرخۆڵەی ساوا ف بره و بزغالهٔ نوزاد.

**شەمزی:** ژاکاو، سیس بوگ ف پژمرده.

**شەمزین:** ۱) شەمزان؛ ۲) ناوچەیەکە لە کوردستان، شەمدینان؛ ۳) شەمچە ف ۱) پژمردن؛ ۲) ناحیه‌ای در کردستان؛ ۳) کبریت.

**شەمزینان:** ناوچەی شەمدینان ف نگا: شەمدینان.

**شەمزیو:** شەمزاو ف پژولیده، پژمرده.

**شەمس:** شەمز ف پژمردگی.

**شەمساوا:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**شەمسۆز:** شەمدان ف شمعدان.

**شەمسە:** سوکەڵەناوی شمس‌الدّین و شمس‌اللّه کە ناوی پیاوانن ف مخفّف نامهای شمس‌الدّین و شمس‌اللّه.
**شەمشە:** چەکچەکیلە، چەکچەکی، شەڤرەڤیك، شەڤرەڤین، شەڤشەڤۆك، شەڤکوێر ف شب‌پره، خفّاش.
**شەمشەڵە:** شەمشە ف شب‌پره.
**شەمشەمۆتك:** جۆرێ‌مارمێلکە ف نوعی مارمولك.
**شەمشەمە:** شەمشە ف شب‌پره.
**شەمشەمەکوێرە:** شەمشە ف شب‌پره.
**شەمشێر:** شیری تیخ، شوور، شمشێر ف شمشیر.
**شەمشێرکرۆژ:** برێتی لە پیاوی ئازا لە شەڕ ف کنایە از جنگجوی شجاع.
**شەمع:** مۆم، شەم ف شمع.
**شەمعدان:** شەمان، شەمدان ف شمعدان.
**شەمعوناوە:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان کە بعثیان آن را ویران کردند.
**شەمل:** جاجم یان هەر کرێك کە دەخۆیەوە دەپێچن ف هرچە خود را در آن پیچند.
**شەملك:** ۱) دوگرد، بەرماڵ؛ ۲) شتێ کە خوار کەمبەر دادەپۆشێ، فۆتە ف ۱) سجّادە، جانماز؛ ۲) پیش‌بند، لُنگ.
**شەمۆ:** شەمبو ف شنبە.
**شەممە:** ۱) شەم، شەمبۆ؛ ۲) گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف ۱) شنبە؛ ۲) نام روستایی در کردستان کە توسط بعثیان ویران شد.
**شەمۆ:** شەم، شەمبۆ ف شنبە.
**شەمۆز:** چەمۆش ف چموش.
**شەمۆس:** چەمۆش ف چموش.
**شەمۆلە:** شەمالە ف فالگوش.
**شەموڵە:** چرافتیلە، قودیك ف چراغ موشی.
**شەمومە:** شەمامە ف دستنبو.
**شەمە:** شەمبو ف شنبە.
**شەمەترێلکە:** هەنگێکی باریکی رەشکەڵەیە شانە لە ناو درزکانداهەڵدەبەستێ و هەنگوینی زۆر خۆش دروست دەکا ف نوعی زنبور وحشی کە عسل بسیار لذیذدارد.
**شەمەتلێنکە:** شەمەترێلکە ف نگا: شەمەترێلکە.
**شەمەد:** پۆپەشمین ف شَمَد.
**شەمەسرێلکە:** شەمەترێلکە، کوریفۆك ف نگا: شەمەترێلکە.
**شەمەلە:** چەکچەکی ف شب‌پره.
**شەمەلەکۆرە:** چەکچەکی، شەمەلە ف شب‌پره.
**شەمەند:** زەق‌وقیتی جوان‌و لەبەرچاو: (مەمکی تورت‌و گردو شەمەندن) ف برجستە و زیبا و خوش‌نما.
**شەمەندەفەر:** قەتاری رێی ئاسن ف ترن، قطار راه‌آهن.
**شەمەنیخە:** ۱) پێسیری یەکتر گرتن‌و دەگژیەك راچوون؛ ۲) کێشانی شتی قورس بە نیخەنیخ ف ۱) دست بە یقە شدن و گلاویزشدن؛ ۲) کشیدن جسم سنگین با هن‌هن.
**شەمی:** شەمبو ف شنبە.
**شەمێ:** ۱) شەم، مۆم؛ ۲) ناوی ژنانە ف ۱) شمع؛ ۲) نام زنانە.
**شەمیت:** ۱) شەمت، خلیسك؛ ۲) کەڵەکە، بەسەریەکداکراو ف ۱) لیزگاه؛ ۲) برهم انباشتە.
**شەمیتۆك:** جێگەی خلیسکان ف لیزگاه.
**شەمیتێن:** ۱) خلیسکان، شەمتین؛ ۲) هاویشتنە سەریەك ف ۱) لیزخوردن؛ ۲) برهم انباشتن.
**شەمیخ:** ترشان، کەف‌کردن، خرابوون، بۆن‌گرتن ف کف‌کردن، ترشیدن آش.
**شەمیخین:** ترشانی چێشت لەبەر گەرما ف فاسدشدن غذا از گرما.
**شەمیران:** ۱) پێك‌هاتن، جێ‌بەجێ، ئەنجام؛ ۲) ناوچەیەکە لە کوردستان ف ۱) انجام، درست شدن کار؛ ۲) منطقەای در کردستان.
**شەمیراندن:** بەئەکام گەیاندنی کار، ئەنجام‌دان، پێك‌هێنان بە تەواوی ف تمام کردن کار، انجام دادن.
**شەمیك:** رێسمەی درگا ف پاشنۀ در.
**شەمێلە:** ۱) دانەوێڵەیە کە گاجوتی پێ قەڵەو دەبێ؛ ۲) شەمۆڵەی ژنان ف ۱) نوعی حبوب کە بە گاو می‌دهند؛ ۲) فالگوش ایستادن زنان.
**شەن:** ۱) داری چوارچنگی خۆیان‌بەبادان، شەنە؛ ۲) خۆیان‌هەڵاویشتن؛ ۳) کاوکوتێ کە دەتەندوری دەرێژن ف ۱) افشون، چنگك؛ ۲) خرمن باددادن؛ ۳) کاه و خاشاکی کە در تنور ریزند.
**شەناخ:** شمراخ، شناخ ف نگا: شناخ.
**شەند:** دەنوك، دندوك ف منقار.
**شەندە:** ناوی نامەعلوم: (شەندە لە مەندە کەمتر نیە) ف نام مجهول.
**شەندەلی:** دندوك‌دار ف دارای منقار.
**شەنکەر:** کەسێ کە خۆیان بە شەن دەکا: (خەرمانی خەمان ها وەدەم باوە/شەنکەر یەکێکە دوو شەن وەلاوە) «مەولەوی» ف کسی کە خرمن باد میدهد.
**شەنگ:** ۱) جوان‌و لەبار؛ ۲) شڕو شاتاڵی ناو ماڵ؛ ۳) فیشەکی تفەنگ ف ۱) زیبا و رعنا؛ ۲) خرت و پرت اثاثیە؛ ۳) فشنگ.
**شەنگاو:** شەقاو ف گام فراخ.
**شەنگڵ:** ۱) شنگل، شلنگ؛ ۲) پیکەوەنوسان ف ۱) تکان بخود دادن؛ ۲) بهم چسبیدن.
**شەنگڵە:** دودانە بەری داری پێکەوەنوساو ف دوثمر بهم چسبیدە.
**شەنگڵەبەرەکەت:** شەنگڵە ف نگا: شەنگڵە.
**شەنگلەبەرەکەتە:** شەنگڵە ف نگا: شەنگڵە.
**شەنگۆڵ:** ۱) شەنگڵە؛ ۲) زۆر لەسەر کەیف‌و دڵخۆش ف ۱) نگا: شەنگڵە؛ ۲) بسیار شاد وسرحال، شنگول.
**شەنگە:** ۱) جوان‌و لەبار؛ ۲) بەهێزو تاقەت‌و توان ف ۱) زیبا و خوش اندام؛ ۲) توانا.
**شەنگەبەرە:** شەنگڵە ف نگا: شەنگڵە.

**شەنگەبی:** شۆڕەبی ف بید مجنون.

**شەنگەبێری:** بیری جوان و لەبەردڵان ف کدبانوی زیبا و رعنا.

**شەنگەدار:** داری جوان و لەبار ف درخت شاداب و جوان.

**شەنگەسوورە:** ژەنگەسوورە ف زنبور قرمز.

**شەنگەشڕ:** بەرگی شڕ و کۆنە ف رخت کهنه وپاره.

**شەن وکەوکردن:** ١) خاوێن کردنەوەی دەخڵ؛ ٢) بریتیە لە لێکۆڵینەوە ف ١) بوجاری؛ ٢) کنایه از پژوهش.

**شەنە:** شەن ف افشون، چنگک.

**شەنەدێر:** کەسێ بە شەن خەرمان هەڵداوێ ف کسی که خرمن باد می‌دهد.

**شەنی:** کرێت، خوێنتاڵ، نێسك گران ف بدگل، ناهنجار.

**شەو:** شەف، شەڤ ف شب.

**شەوات:** سوتمان، ئاگر بەربوونەوە ف حریق، آتش سوزی.

**شەواتە:** تەواو سوتاو ف کاملاً سوخته.

**شەواتەك:** سوتەمەنی، ئێزنگ و قەڵاشکەری ف سوخت، مواد سوختنی.

**شەوادی:** دوێ شەو ف دیشب.

**شەوادیتر:** دو شەو پێش، پێرێ شەو ف پریشب.

**شەوار:** تەنگی نوێژی شێوان ف شباهنگام، بعد از غروب.

**شەوارە:** شەڤارە ف شکار پرنده در تاریکی بوسیلهٔ چراغ.

**شەوارەبوون:** کەوتنەدوای شەوارەوە، بە شەوارە کەوتن ف از نور چراغ به دام افتادن.

**شەوارەکەوتن:** شەوارەبوون ف نگا: شەوارەبوون.

**شەواژۆ:** شەڤین، چەڕاندنی مێگەل بە شەو ف چرانیدن گله در شب.

**شەواشینك:** بەری داریکە وەك بادامی ورد دەیکوڵێنن و دەخورێ ف ثمری است بادام آسا جوشیده می‌خورند.

**شەواك:** بێ هۆش، گێلۆکە ف دبنگ، ساده‌لوح.

**شەواڵ:** ١) شەڵوار؛ ٢) مانگی شەشەکان ف ١) شلوار؛ ٢) ماه شوّال.

**شەواڵ بەکوڵ:** شەرواڵ بەکوڵ، گیایەکە ف گیاهی است.

**شەواڵەسوورە:** شەرواڵ بەکوڵ، گیایەك ف گیاهی است.

**شەواڵەموور:** شەرواڵ بەکوڵ ف گیاهی است.

**شەوان:** سەردەمانی تاریکایی دنیا ف شبها.

**شەوانە:** بەشەو: (**شەوانە** خەریکی خوێندنەوەی کتێبم) ف شبانگاهان.

**شەواو:** ئاوێ کە بە شەو لە زرعات دەنرێ: (گریانی بەیانانی منە باعیسی خەندەت/پشکوتنی گوڵ مایەیی لێنانی **شەواوە**) «ئەدەب» ف آبیاری شبانه.

**شەوب:** پەتا، نەخۆشی گیرۆ، ئاهۆ ف بیماری واگیر.

**شەوبا:** سروە لە شەودا ف نسیم شبانه.

**شەوباش:** وشەیەکە لە جێگەی سڵاو لە شەودا دەیڵێن ف شب خوش، درود شبانه، شب بخیر.

**شەوبۆ:** گوڵێکە رەنگ بنەوش لە پاش رۆژاوا بۆنی خۆش دەدا: (**شەوبۆیی** سەری سونبولی زولفت لە سەری دام/ئێستەش سەرەکەم مەستە لەبەر نەشئەیی شەوبۆ) «نالی» ف گل شب‌بو.

**شەوبۆ:** هێشتا نەبوە رۆژ ف شب بود.

**شەوبوێر:** شەو نا شەو ف یکشب درمیان.

**شەوبەك:** تیرۆکی ئەنگوتك پان کردنەوە ف چوبك چونه پهن کردن.

**شەوبەن:** ١) داری درگا لەپشتەوە داخستن؛ ٢) کۆستەکی خەنجەر ف ١) چوب بستن در از داخل؛ ٢) تسمه‌ای که خنجر را در کمر می‌بندد.

**شەوبەند:** شەوبەن ف نگا: شەوبەن.

**شەوبێدار:** کەسێ لە شەوا ناخەوێ ف شب‌زنده‌دار.

**شەوبێر:** شەوبوێر ف شب اندرمیان.

**شەوبێری:** شەو پێکەوە بواردنی هەواڵان، شەونشینی ف شب‌نشینی.

**شەوبین:** وشك بوونی چێندراو بەرلە کاتی خۆی ف خشك شدن کشتزار قبل از اوان.

**شەوپاتە:** چێشتێ کە شەو لێی دەنێن بۆ رۆژێ دادێ: (ترخێنەی **شەوپاتە** خۆشە) ف غذایی که شب برای فردا می‌پزند.

**شەوت:** نەخۆشیەکی ناو گوێی ئاژەڵە ف نوعی بیماری گوش دام.

**شەوتا:** تای شەوانە، تۆبەتێ لە شەودا ف تب شبانه.

**شەوتان:** سوتان، ئاگرتێ چون ف سوختن.

**شەوتاندن:** سوتاندن ف سوزاندن.

**شەوتاندوخ:** سوتێن ف سوزاننده.

**شەوتی:** سوتاو، سوزیاو ف سوخته.

**شەوتێ:** تای شەوانە ف تب شبانه.

**شەوتین:** سوتان ف سوختن.

**شەوجمعانە:** چێشتونان بۆخێری مردو لەشەوی ئینیدا ف خوراکی که شبهای جمعه به یاد مرده بخشند.

**شەوچرا:** ١) چرای ڕاوی مەل لەتاریکاییدا، چرای شەوارە؛ ٢) جەواهێراتێ کەلەشەودا دەترووسکێ: (ئێژی گەوهەری **شەوچراس**) ف ١) چراغ شکار پرنده در شب؛ ٢) گوهر شب چراغ.

**شەوچەپکەن:** کراسی ئاودامێنی ژنانە کەبەتایبەتی شەو دەیپۆشن: (**شەوچەپکەنی** نیلوفەرێ و جیلوەیی رەقسی/شەرمەندە دەکەن زوهرەیی زەهرا لەسەمادا) «نالی» ف پیراهن دامن بلند زنانه که شب می‌پوشند.

**شەوچەرە:** خواردنێ کە لە شەوبێری دەخورێ ف شب‌چره.

**شەوچەلە:** شەوچەرە ف شب‌چره.

**شەوخوون:** شەبەیخون، پەلاماری شەوانە ف شبیخون.

**شەوخوونی:** ١) شەبەیخون؛ ٢) شەوبێداری، شەو نەخەوتن ف ١) شبیخون؛ ٢) شب بیداری.

**شەوخەف:** بەرگی خەوێ، جلکی ناو نوێن ف لباس خواب.

**شەوخی:** شەبەیخون، پەلاماری شەوانە ف شبیخون.

**شەوداوەت:** هەڵپەڕینی شەوانە ف رقص دسته‌جمعی شبانه.

**شەودەر:** شەبدەر، گیایەکە ف شبدر.

**شەودێر:** شەواو لەزرعات نان ف آبیاری شبانه.

**شەودێری:** بە شەو ئاودانی زرعات ف آبیاری شبانه.

**شەودێز:** ١) تارمایی لە شەودا؛ ٢) یەکسمی رەش بە پنۆکی سپیەوە؛ ٣)

ناوی ئەسپی خوسرەوی مێردی شیرینی فەرهاد ف ۱) شبح؛ ۲) ستور سیاەرنگ با خالهای سپید؛ ۳) اسب خسرو پرویز.

**شەورۆ:** کەسێ بە شەو بەڕێدا دەڕوا ف شبرو.

**شەورەنگ:** ۱) بەردێکی رەشی بەنرخە، شەوە، شەڤە؛ ۲) زۆر رەش ف ۱) شبه؛ ۲) بسیار سیاه.

**شەورەو:** ۱) ڕاکردن لە دەست دوژمن لە شەودا؛ ۲) شەورۆ ف ۱) فرار در شب؛ ۲) شبرو.

**شەورەوی:** ۱) شەورۆیی؛ ۲) شەو ڕەوکردن ف ۱) شبروی؛ ۲) فرارکردن در شب.

**شەوزمسان:** یەکەم شەوی زستان ف شب یلدا.

**شەوزوسان:** شەوزمسان ف شب یلدا.

**شەوژەن:** ۱) شەوبەن، داری دەرگا لە ژوورەوە داخستن؛ ۲) کۆستەکی خەنجەر ف ۱) چوب بستن در از داخل؛ ۲) کوهٔ دستهٔ خنجر.

**شەوسان:** شەبستان ف شبستان.

**شەوسکڵ:** خۆیانی وردی هێشتا تەواونەبوگ ف خرمن نیم کوبیده.

**شەوسو:** سبەی ئەمشەو ف فردای امشب.

**شەوسوتکە:** کوانێکی بەژانە لە دەست و یا دێت ف دُملی است بر دست و یا درآید.

شەوسوتکە: جۆرێ پێشکە ف نوعی پشه.

**شەوسوتەکە:** شەوسوتکە ف نوعی پشه.

**شەوشین:** لارەولار رۆیشتن ف تلوتلوخوردن.

**شەوش:** پەرێشانی، بێ‌سەرەوبەرەیی ف پریشانی، درهم برهمی.

**شەوشەمەکێ:** شەمۆلە، شەمالە ف فالگوشی.

**شەوشین:** پەرێشان‌بوُن، بێ‌سەرەوبەرەبوُن ف پریشان و درهم برهم شدن.

**شەوق:** ۱) رۆشناکی؛ ۲) تاسەو نارەزوُ؛ ۳) کەیف‌خۆشی، شادی ف ۱) روشنی، تابش؛ ۲) رغبت؛ ۳) شادی و ذوق.

**شەوقدار:** خاوەن‌شەوق ف دارای «شەوق».

**شەوقدان:** تروسکان، درەوشین ف درخشش.

**شەوقدانەوە:** تروسکانەوە، تیشك‌دانەوە ف انعکاس پرتو.

**شەوقکردن:** بە دڵخۆشی رابواردن، کەیف‌کردن ف بەشادی بسر بردن، کیف‌کردن.

**شەوق لێ‌بوُن:** ئارەزوُکردن ف رغبت‌داشتن.

**شەوك:** ۱) دەرزیلە، زەنبەرێکە دە سەرو پێچ دەچەقێندرێ؛ ۲) قولاپی ماسی‌گرتن ف ۱) زیوری کە بر دستار زنند؛ ۲) قلّاب ماهیگیری.

**شەوکار:** کاری شەوانە ف شبکار.

**شەوکراس:** کراسی ناو نوێن ف پیراهن خواب.

**شەوکڵاو:** تەقیلەی سەر لە دەمی خەوتن‌دا ف شب‌کلاه.

**شەوکوُر:** کەسێ کە بە شەو نابینێ و بە رۆژ دەبینێ، بەرانبەری کەژ ف شبکور.

**شەوکوُر:** شەوکوُر ف شبکور.

**شەوکۆرە:** ۱) شەوکوُر؛ ۲) چەکچەکی ف ۱) شبکور؛ ۲) شب‌پره.

**شەوکۆری:** نەخۆشی بەشەو نەدیتن ف بیماری شبکوری.

**شەوکوك:** کەسێ کە مەردم لە خەو بێدار ئەکا ف بیدارکنندهٔ مردم از خواب شبانه.

**شەوکوێر:** شەوکوُر ف شبکور.

**شەوکوێری:** شەوکۆری ف بیماری شبکوری.

**شەوکە:** شەوك ف نگا: شەوك.

**شەوکەت:** ۱) جوان‌چاکی: (پیاوێ بە **شەوکەتە**)؛ ۲) گەورەیی و پایەبەرزی؛ ۳) ناوە بۆ ژن و پیاو ف ۱) حسن و جمال؛ ۲) جاه و جلال؛ ۳) نام مردانه و زنانه.

**شەوکێڵ:** ۱) کەسێ بە شەو جوُت لێ دەخورێ؛ ۲) شوکراو بە شەو ف ۱) کسی کە شبانه شخم می‌زند؛ ۲) زمین شخم‌زده در شب.

**شەوگ:** شەڤە، بەردێکی رەشی بەنرخە، شەورەنگ ف شبه.

**شەوگا:** جێگەی پشودانی ئاژەڵ لە شەوا لە دەشت، شەڤین ف جای آسودن گله شبانه در دشت.

**شەوگار:** سەرانسەری شەو، شەوانە ف شبانگاهان.

**شەوگر:** کەسێ شەو نوێژ دەکاو ناخەوێ ف کسی کە نماز شب می‌خواند.

**شەوگڕ:** چراخان، چراخانی ف چراغان.

**شەوگرتی:** شەوگر ف نگا: شەوگر.

**شەوگور:** کازێوە، بولێڵە، بەیان‌بەربوُن، شەڤگور ف گرگ و میش اوّل بامداد.

**شەوگەڕ:** ۱) کەسێ شەو ناخەوێ و بە ناو ئاواییدا خول دەخوا؛ ۲) ئاسیاوێ کە هەر بە شەو ئەگەڕێ؛ ۳) هەڵپەڕینی شەوی دوای زەماوەند ف ۱) شبگرد؛ ۲) آسیابی کە شبانه کار می‌کند؛ ۳) مراسم شب بعداز عروسی.

**شەوگەرد:** ۱) جۆرێ مارمێلکە دەڵێن پێوە دەدا؛ ۲) کەسێ بە شەو دەگەڕێ ف ۱) نوعی مارمولك؛ ۲) شبگرد.

**شەوگێر:** دوگوندی کوردستان بەم ناوە بەعەسی کاولی کردوە ف دوُ روستا بە این اسم در کردسان توسط بعثیان ویران شدە است.

**شەوگێڕ:** شەوگەڕ، ئاسیاوێ کە هەر بە شەو کار دەکا ف آسیابی کە فقط شبانه کار می‌کند.

**شەوول:** ۱) دەشتایی نێوان چیا؛ ۲) تینی گەرما ف ۱) جلگهٔ بین کوهستان؛ ۲) گرما.

**شەولدان:** قەدەم، تینی‌تاو کە لە تاوساندا مرۆ لەپێشەوە دەبینێ ف نورخورشید.

**شەولە:** ۱) جێگەی پەین‌هەڵخستنی تونخانە؛ ۲) کەوای پڕپینەی دەروێش ف ۱) شولهٔ گلخن؛ ۲) قبای مرقّع دراویش.

**شەولەبان:** ۱) برێتی لە سەگی پاسەوانی ماڵ؛ ۲) وشەیەکە منالی پێ دەترسێنن: (بنو **شەولەبان** هات)؛ ۳) باگردان ف ۱) سگ نگهبان خانه؛ ۲) کلمەای برای ترساندن کودك؛ ۳) بام غلتان.

**شەولەوەڕ:** چەڕینی ئاژەڵ لە شەودا ف شب‌چرای گله.

**شەومە:** تاڤ‌هەیڤ، ترێڤە ف مهتاب.

**شەومەن:** شەوی، بەیات ف شب‌مانده، بیات.

**شەومەندە:** شەومەن، شەوی ف شب‌مانده.

**شەومەنە:** شەومەن ف شب‌مانده.

**شەونخوون:** شەوبێدار ف شب‌بیدار.

**شەونخوونی:** شەوبێداری ف شب‌بیداری.

**شەونشین:** شەوبێدار، کەسێ بەشەو نەخەوێ ف شب‌بیدار.

**شەونشینی:** شەو لە دەوری یەك کۆ بوونەوەی دۆست‌و خێزان ف شب‌نشینی.

**شەونم:** شەڤنم، شەڤنەم، ئاونگ ف شبنم.

**شەونوخوونی:** شەونخوونی ف شب‌بیداری.

**شەونوێژ:** نمێژ لە شەوا پاش هێندێ خەوتن ف تهجّد، عبادت نیمه‌شب.

**شەونەخوس:** شەونخوون ف شب‌بیدار.

**شەونەخوسی:** شەونخوونی ف شب‌بیداری.

**شەووڕۆژ:** هەمودەم بێ‌پسانەوە ف همیشه، شبانه‌روز.

**شەووڕۆژی:** کاری هەمودەم بێ وچان ف کار شبانه‌روزی.

**شەوونی:** شوانی ف چوپانی.

**شەوە:** ۱) بەردی ڕەشی بەنرخ؛ ۲) جنۆکەی ساواخنکێن؛ ۳) مۆتە، مۆتەکە؛ ۴) ڕۆژنیە، لە شەو داین ف ۱)شبه؛ ۲) جن نوزادکش؛ ۳) کابوس، بختك؛ ۴) شب است.

**شەوهاندن:** ۱)تێکەڵ‌وپێکەڵ کردن؛ ۲) بیچم ناحەزکردن ف ۱) درهم برهم کردن؛ ۲) بدشکل کردن.

**شەوەبردنەوە:** مردنی ساوا لە دەس جنۆکەی ساواخنکێن ف مرگ نوزاد توسط جنّ نوزادکش.

**شەوەبینین:** مۆتەکە لە خەوا دیتن ف کابوس درخواب دیدن.

**شەوەخوار:** گیای تەڕ کە بۆ شەولەوەڕی دێننەوە ف علف تازه برای شب‌چرای دام.

**شەوەدیتن:** لە خەوا مۆتەکە دیتن ف کابوس در خواب دیدن.

**شەوەر:** شەبدەر، شەودەر ف شبدر.

**شەوەڕ:** شەبدەر ف شبدر.

**شەوەزەنگ:** شەوی زۆر تاریك‌و ئەنگوستەچاو ف شب دیجور.

**شەوەسارە:** شەوپاتە، چێشتی شەو بۆ سبەی ف غذای شب برای فردا.

**شەوەکی:** ۱) بەرەبەیان، شەبەقی؛ ۲) شەوانە ف ۱) بامداد پگاه؛ ۲)شب هنگام.

**شەوی:** ۱) کراس، گجی؛ ۲) دەخڵێ کە زوو پێ بگا؛ ۳) شەومەنە؛ ۴) شەویلکە ف ۱) پیراهن؛ ۲) غلّهٔ زودرس؛ ۳) شب مانده؛ ۴) آرواره.

**شەوێ:** ۱) مۆتەکە، شەوە؛ ۲) یەك شەو ف ۱) کابوس؛ ۲) یك شب.

**شەوێق:** ۱) پەرێشان‌و بێ‌سەرەوبەرە؛ ۲) سست‌و ناقایم: (شل‌و شەوێق) ف ۱) پریشان حال؛ ۲) سست و نامحکم.

**شەویلاك:** ئەم‌لاولای چەنە ف آرواره.

**شەویلاکە:** شەویلاك ف آرواره.

**شەویلکە:** شەویلاك ف آرواره.

**شەویلە:** شەویلاك ف آرواره.

**شەوین:** ۱) شەوێن؛ ۲) ڕەش بە ڕەنگی شەو، شەوڕەنگ؛ ۳) چەمانەوە؛ ۴) چەمیو ف ۱) نگا: شەوێن؛ ۲) سیاه؛ ۳) خمیدن؛ ۴) خمیده.

**شەوێن:** ۱) چەڕانـدنی ئاژەڵ بە شەو، شەڤین؛ ۲) جێگەی پشـوودانی ئاژەڵ شەوانە لە دەشت ف ۱) شب چرا؛ ۲) شبغاز.

**شەهـ:** ۱) شە، شانـەی سەرو کوڵکە؛ ۲) بنـەمـای وشـەی شانـدن، بەڕێ کردن؛ ۳) شا، شاه، پادشا، پاڵشا؛ ۴) ڕوباری گەورە، شەت؛ ۵) پوپەی کەڵەباب ف ۱) شانهٔ سر، شانهٔ پشم صاف‌کن؛ ۲) ریشهٔ لغت «شاندن» یعنی روانه کردن؛ ۳) شاه؛ ۴) شط؛ ۵) تاجِ خروس.

**شەهە:** حیلەی ئەسپ، حینە ف شیههٔ اسب.

**شەهادە:** ۱) شایەتی، ئاگاداری لە ڕوداو؛ ۲) بڕوانامەی خوێندن ف ۱) گواهی؛ ۲) گواهینامهٔ تحصیلی.

**شەهان:** شاندن، ناردن، ڕەوانەکردن ف فرستادن.

**شەهاندن:** شەهان ف فرستادن.

**شەهەت:** شیڵەڵێ‌دراو، دەست‌وپێ شل‌و بێ‌هەست ف فَلَج.

**شەهەتین:** لە تینگی مردن ف مرگ از تشنگی.

**شەهەر:** ۱) شار، بازێڕ؛ ۲) شەدەی سەری ژنان ف ۱) شهر؛ ۲) سرپیچ زنانه.

**شەهەرڤانی:** بازێڕی، شارنشینی ف شهرنشینی.

**شەهەرواری:** شەهەرڤانی ف شهرنشینی.

**شەهەرزا:** شارەزا ف نگا: شارەزا.

**شەهەریە:** هەرشتە ف رشتهٔ آش.

**شەهەفی:** جۆرێ ترێ کە درەنگ پێ‌دەگا ف نوعی انگور دیررس.

**شەهەك:** ۱) شانـەی چکـۆڵـەی سەرداهێنان؛ ۲) کوندەئاوی پچوك، مەشکەی ئاوکێشـان کە زل نەبێ ف ۱) شانهٔ کوچك سر؛ ۲) مَشك کوچك آب.

**شەهەکردن:** بەشانەکردنی سەر ف شانه‌زدن موی.

**شەهەلوول:** شالوول، ڕیشۆڵە، گاوانی ڕەش ف سار سیاه.

**شەهەلەوەند:** ۱) لاوی شۆخ‌و شەنگ؛ ۲) سوارچاك ف ۱) جوان زیبای خوش قیافه؛ ۲) یکه‌سوار.

**شەهەمار:** هەزارپێ، زێڵو ف هزارپا.

**شەهەمێر:** پیاوی پیاو، مەردو ڕەند ف رادمرد.

**شەهەن:** شەهـ، شە، شانە ف شانهٔ سر.

**شەهەنك:** خاڵی سەرگۆنا ف خال واقع برگونه.

**شەهەو:** ڕێگەی زۆر دژواری بەرداوی ف راه سنگلاخِ صعب‌العبور.

**شەهەوان:** بەردەلان ف سنگلاخ.

**شەهەسنان:** هۆزێکی کوردە ف طایفه‌ای از کردها.

**شەهی:** ۱) خۆشـەویستی لە شەڕداکوژراو؛ ۲) گوندێکە لە کوردستان بەعەسی وێرانی کرد ف ۱) شهید؛ ۲) از روستـاهـای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**شەهێ:** گوندێکی کوردستانە بەعەسی کاولی کرد ف نام روستـایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**شەهید:** شەهی ف شهید.

**شەهین:** ۱) حیلاندن؛ ۲) تەرازو؛ ۳) شاهێنی تەرازو ف ۱) شیهە کشیدن اسب؛ ۲) ترازو؛ ۳) شاهین ترازو.

**شەهێن:** ۱) شاهێن؛ ۲) ناوی دارێکە ف ۱) شاهین؛ ۲) نام درختی است.

**شەهەینی:** جۆرێ هەنگوری چەرمگ کە زوو پێ دەگا ف نوعی انگور سفید زودرس.

**شهی:** نزگەرە ف سکسکە.

**شەی:** شەوی، کراس ف پیراهن.

**شەیپوور:** زورنای لەشکر، بۆری ف شیپور.

**شەیپوورژەن:** بۆری‌ژەن ف شیپورچی.

**شەیتان:** ۱) مەلەك‌تاوس، بنەمای خراپە؛ ۲) برێتی لە شوفارو ئاژاوەچی؛ ۳) برێتی لە زرنگ ف ۱) شیطان؛ ۲) کنایە از مفتن؛ ۳) کنایە از زرنگ.

**شەیتان‌ئاوس:** ۱) گیسکی دووبەهارە کە زگی پڕ ببێ؛ ۲) مێوینەیێ کە زگی ئاوسابێ وا بزانن ئاوسەو ئاوسیش نەبێ ف ۱) بزغالهٔ دوسالهٔ آبستن؛ ۲) شکم برآمدهٔ آبستن‌نما کە آبستن نباشد.

**شەیتان‌پەرس:** یەزیدی، ئێزدی، داسنی ف یزیدی.

**شەیتان‌پەرست:** شەیتان‌پەرس ف یزیدی.

**شەیتان‌پێکەنین:** بالق‌بوون ف بالغ شدن، احتلام.

**شەیتانۆکە:** ۱) گیاندارێکی پچووکی نەرم‌و شل‌و ولە لە ناو قاپێلکێ سەدەفین‌دا بەهاران پاش باران دەژیتەوە؛ ۲) قاپێلکی ئەو گیاندارە ف ۱) حلزون؛ ۲) صدف حلزون.

**شەیتان‌لغاو:** بەسەری هەوسار بەستنی لێوی خواروی یەکسم لەباتی لغاو ف بستن لب زیرین ستور بجای لگام.

**شەیتانی:** ۱) بیر و کاری خراپ؛ ۲) گان لە خەودا؛ ۳) دوزمانی ف ۱) فکر و کار زشت؛ ۲) خواب جنسی، احتلام؛ ۳) سخن‌چینی.

**شەیتانی‌بوون:** ۱) لە خەوا گان‌کردن؛ ۲) بالق‌بوون ف ۱) خواب جنسی دیدن؛ ۲) بالغ شدن.

**شەیدا:** ۱) دینی ئەوین، دێوانەی عەشق؛ ۲) ناوی ژنانە ف ۱) والهٔ عشق؛ ۲) نام زنانە.

**شەیلە:** شلوێ، شێلوو، ئاوی نەپاقژو زەلال ف آب ناصاف.

**شهین:** ۱) حیلەکردنی ئەسپ، حیلاندن؛ ۲) خوێندنی کەڵەباب؛ ۳) کۆخە، قۆزە، کۆکە ف ۱) شیهە کشیدن اسب؛ ۲) صدای خروس؛ ۳) سرفە.

**شی:** ۱) رۆیشت، چو؛ ۲) شوو، مێردی ژن؛ ۳) لەبەریەك هەڵوەشانی لۆکەو کولکە؛ ۴) راڤە، شەرح لە شتی گران؛ ۵) جودایی ف ۱) رفت، گذشت؛ ۲) شوهر؛ ۳) زدن پنبه و پشم؛ ۴) شرح و تفسیر؛ ۵) جدایی.

**شێ:** ۱) یەکسمی زەردی ئامال سوور؛ ۲) ئەسپی سپی بە پنۆکی سوور؛ ۳) ئەسپی رەنگ سووری پنۆك‌سپی؛ ۴) رەنگی‌رەش؛ ۵) نم، تەڕایی؛ ۶) توانایی: (ئەز نەشێم، تە دەشێی)؛ ۷) یەکسمی سێ‌پەل سپی ف ۱) اسب زرد مایل به سرخی؛ ۲) اسب سفید با خال قرمز؛ ۳) اسب سرخ با خالهای سفید؛ ۴) مشکی رنگ؛ ۵) نم؛ ۶) توان؛ ۷) اسب سەپاسفید.

**شیا:** ۱) توانی، لە دەستی هات؛ ۲) رۆیشت؛ ۳) بوو، رەوای ئەو بوو: (کراسەکەم بە بەرم تەنگ بوو بۆ کورەکەم شیا) ف ۱) توانست؛ ۲) رفت؛ ۳) روابود.

**شیات:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان کە توسط بعثیان ویران شد.

**شیارۆك:** خیگە، هیزە، پێستەی رسق‌تێ‌کردن ف خیگ.

**شیارە:** شارە ف نگا: شارە.

**شیافیك:** گیایەکە بۆ رەوان‌بوون دەیخۆن ف گیاهی است مُسهل.

**شیاق:** جۆرێ پارچەی کوتاڵ ف نوعی قماش.

**شیاکە:** ریخ، سنێر، سەرین، گوشلەی گاو مانگا ف سرگین‌تر.

**شیان:** ۱) توانین، لەدەست‌هاتن؛ ۲) رۆیشتن، چوون؛ ۳) لێ‌وەشانەوە، پێ‌رەوابوون، لێهاتن ف ۱) امکان، قدرت، توانستن؛ ۲) رفتن؛ ۳) سزاواری.

**شیاندن:** شاندن ف نگا: شاندن.

**شیانست:** شایان ف سزاوار.

**شیاو:** ۱) لایق، هێژا؛ ۲) رۆیشتو؛ ۳) ناردراو ف ۱) سزاوار؛ ۲) رفته؛ ۳) فرستاده.

**شیای:** ۱) رۆیشتو؛ ۲) تۆپیو، کەوتی ف ۱) رفته؛ ۲) سقط‌شده، حیوان مرده.

**شیاین:** تۆپین، کەوتین، سەکەت‌بوون ف مردن حیوان، سقط‌شدن.

**شیب:** رزیوی لەکارکەوتو: (کراسەکەی ونجر ونجر بەجارێك ببوە شیب) ف پوسیده.

**شیبا:** ۱) رووناکی و بریقە؛ ۲) سوکەبای شەوانە ف ۱) روشنی و رونق؛ ۲) نسیم شبانە.

**شیبەڵەك:** دوورەنگی سوورو سپی ف خلنگ سرخ و سفید.

**شیپ:** ۱) گوپ، پێست‌و گۆشتی نێوان شەویلکەو سەر گۆنا؛ ۲) سیرمەی قامچی؛ ۳) رنوو، شاپە؛ ۴) لافاوی بەتەوژم؛ ۵) جۆرێ پڵنگ ف ۱) میان آرواره و گونه، لُپ؛ ۲) تسمهٔ تازیانە؛ ۳) بهمن؛ ۴) سیلاب؛ ۵) نوعی پلنگ.

**شێپ:** دەرەتەنگ، خڕو دۆڵی باریك لە چیا ف درهٔ تنگ در کوه.

**شیپان:** چوارچێوەی درگا ف درپواس، چهارچوب در.

**شیپانە:** شیپان ف نگا: شیپان.

**شیپك:** ۱) پاژنەی درگا؛ ۲) شیپ، گوپ ف ۱) پاشنهٔ در؛ ۲) زیرگونە، لُپ.

**شیپۆر:** تورەیی، قەڵسی ف خشم.

**شیپۆران:** گورەو هەرای بەتورەیی ف غُرّش خشم‌آلود.

**شیپە:** ۱) ئامرازێکە لە نیر و ئامووردا؛ ۲) پانایی تیغ؛ ۳) لاشیپانەی درگا؛ ۴) حیلەی ئەسپ؛ ۵) سیرمەی شەلاخ؛ ۶) شەپۆل، پێل ف ۱) ابزاری در خیش؛ ۲) پهنای تیغ؛ ۳) چوب بلند درپواس؛ ۴) شیههٔ اسب؛ ۵) تسمهٔ تازیانە؛ ۶) موج.

**شیپەل:** شەپۆل، پێل ف موج.

تعقیب؛ ۲) پیروی.

**ڤه‌شه‌پلان:** په‌شێو بوُن، بێ‌سه‌ره‌وبه‌ره‌بوُن ف پریشان‌حال شدن.

**ڤه‌شه‌پلاندن:** په‌شێوکردن ف پریشان حال کردن.

**ڤه‌شه‌قان:** ته‌کان‌خواردن، ڕاژان ف تکان‌خوردن.

**ڤه‌شه‌قاندن:** شڵه‌ژاندن، ته‌کان‌پێدان ف تکان دادن.

**ڤه‌شه‌قیان:** ڤه‌شه‌قان ف نگا: ڤه‌شه‌قان.

**ڤه‌شه‌مڕان:** ۱) ئاوێژران، ته‌رك؛ ۲) شێرانه‌وه ف ۱) انداخته‌شدن، پرت؛ ۲) پنهان شدن.

**ڤه‌شه‌مڕاندن:** ۱) ئاویتن، ته‌رك‌کردن؛ ۲) ڤه‌شارتن ف ۱) پرت‌کردن؛ ۲) پنهان کردن.

**ڤه‌شه‌مڕین:** ڤه‌شه‌مڕان ف نگا: ڤه‌شه‌مڕان.

**ڤه‌شێلان:** شێلان ف چلانیدن.

**ڤه‌فر:** غه‌در ف غدر.

**ڤه‌ڤه‌ستان:** ۱)ڕاوه‌ستان؛ ۲) له‌کاروه‌ستان ف ۱) ایستادن؛ ۲) ازکار ایستادن.

**ڤه‌ڤه‌ستاندن:** ۱) ڕاوه‌ستاندن؛ ۲) له‌کاروه‌ستاندن ف ۱) متوقّف کردن؛ ۲) ازکار بازداشتن.

**ڤه‌ڤـه‌ستای:** ۱)ڕاوه‌ستاو به‌پێوه؛ ۲) وێستاو له کار ف ۱) ایستاده؛ ۲) ازکار بازایستاده.

**ڤه‌قوسان:** ۱) بڕان؛ ۲) تاشرانی موُ ف ۱) برش؛ ۲) تراش مو.

**ڤه‌قوساندن:** ۱) بڕین؛ ۲) تاشینی موُ ف ۱) بریدن؛ ۲) تراشیدن مو.

**ڤه‌قه‌تان:** جیابوُنه‌وه ف جداشدن.

**ڤه‌قه‌تاندن:** جیاکردنه‌وه له پێکه‌وه‌نوُساو ف ازهم جداکردن چسبیده.

**ڤه‌قه‌تیان:** جیاوه‌بوُن، لێك‌پچڕان ف جداشدن.

**ڤه‌قه‌تین:** ڤه‌قه‌تیان ف جداشدن.

**ڤه‌قه‌لاشتن:** قه‌ڵاشتن ف شکافتن.

**ڤه‌قـه‌لشـاندن:** زه‌ق روانین، به‌وردی نواڕین. بوچاو ئێژن: (ڤه‌کی ئه‌ز چاڤێن خوّ **ڤه‌قه‌لیشم** چاك دنێرم) ف با دقّت نگاه کردن.

**ڤه‌قه‌ومین:** روداو، به‌سه‌رهات، قوّمین ف حادثه.

**ڤه‌قیژاندن:** زیڕاندن، زیقاندن ف جیغ کشیدن.

**ڤه‌قین:** ده‌نگی خه‌مناکانه‌ی ڕێوی ف صدای نالهٔ روباه.

**ڤه‌کایی:** کاوێژکه‌ر ف نشخوارکننده.

**ڤه‌کایین:** کاوێژ کردن، قاویش کردن ف نشخوارکردن.

**ڤه‌کرژین:** بزه‌کردن ف لبخند زدن.

**ڤه‌کـرن:** ۱) بازکـردن، ڤالاکـرن، ئاواڵـه‌کـردن؛ ۲) شی‌کردنـه‌وه ف ۱)بازکردن، گشودن؛ ۲) ازهم بازکردن، زدن پنبه و...

**ڤه‌کڕوپان:** چاوپوّشی ف چشم‌پوشی از خطا.

**ڤه‌کڕوپاندن:** چاوپوّشی‌کردن ف ماست‌مالی کردن، چشم‌پوشی کردن.

**ڤه‌کـری:** ۱) ڤالابـوُی، ئاواڵه؛ ۲) شی‌کراوه ف ۱) گشوده؛ ۲) ازهم بازشده، پنبه و... زده شده.

**ڤه‌کشـانـدن:** ۱) راخستن، داخستن؛ ۲) راکێشـان به‌زه‌مینـدا؛ ۳) درێژکردنه‌وه؛ ۴) کێشانی توتن‌و جگه‌ره ف ۱) پهن کردن؛ ۲) بر زمین گستردن؛ ۳) کش دادن؛ ۴) استعمال دخانیات.

**ڤه‌کش کشاندن:** ڕاکێشان به‌سه‌ر عه‌رزا ف بر زمین کشانیدن.

**ڤه‌کشین:** ۱) کشانه‌وه، وه‌کشان، به‌ره‌وپاش بزوتن؛ ۲) په‌ژیوان‌بوُنه‌وه، پاشه‌کشه‌کردن ف ۱) برگشتن؛ ۲) پشیمان شدن.

**ڤه‌کوّچاندن:** گوێزانه‌وه، ماڵه‌وماڵ پێ‌کردن ف کوچ دادن.

**ڤه‌کوتاندن:** داکوتانی بزمارو... ف کوبیدن میخ و...

**ڤه‌کوداد:** به‌رباد، داغان ف نابود، داغان.

**ڤه‌کوّرژین:** به‌ددان وردکردن، کروّشتن ف خاییدن، با دندان خرد کردن.

**ڤه‌کوروّژتن:** ڤه‌کوّرژین ف نگا: ڤه‌کوّرژین.

**ڤه‌کوروّژین:** ڤه‌کوّرژین ف نگا: ڤه‌کوّرژین.

**ڤه‌کوشتن:** ۱) گڕنه‌هێشتنی ئاگر: (چرا به فی **ڤه‌کوشت**)؛ ۲) سڕینه‌وه، خه‌ت‌کێشانی نوُسراو؛ ۳) سه‌ربڕین ف ۱) کشتن چراغ و لهیب؛ ۲) پاك کردن نوشته؛ ۳) سر بریدن.

**ڤه‌کوّك:** جه‌ڕباده‌ر، بورغی‌که‌ره‌وه ف پیچ گوشتی.

**ڤه‌کوّلان:** توّژینه‌وه ف پژوهش، کاوش.

**ڤه‌کـه:** ۱) چه‌شنی، جوّرێ، وه‌ك؛ ۲) فرمـانی کردنـه‌وه، ڤالاکه ف ۱) مانند؛ ۲) امر به گشودن، بگشای.

**ڤه‌که‌تن:** ڕازان، ڕاکشان ف درازکشیدن.

**ڤه‌کـه‌ر:** ۱) که‌سێ داخراوێ ده‌کاته‌وه؛ ۲) ئامرازی داخراوکردنه‌وه ف ۱) گشاینده، کسی که می‌گشاید؛ ۲) بازکن، ابزارگشودن.

**ڤه‌کی:** چه‌شنی، به‌جوّرێ ف مانند، مثل.

**ڤه‌کیان:** شڵه‌قان، ژان ف بهم‌زده‌شدن مایع.

**ڤه‌کیشاندن:** ۱) سه‌رمه‌شق دادان؛ ۲) ڕێنوس‌شان‌دان ف ۱) سرمشق نوشتن؛ ۲) دیکته‌کردن.

**ڤه‌کێش:** ۱) ده‌رکێشـان؛ ۲) شتێ که له راکێشان‌دا قایمه‌و ناپسێ؛ ۳) برێتی له چه‌نـه‌بـازێ زوّروه‌ڕ؛ ۴) خوّلـه‌بـه‌ریه‌ك کێشـانـه‌وه؛ ۵) کێشان‌به‌ته‌رازو ف ۱) آختن، برکشیدن؛ ۲) کشدار؛ ۳) کنایه از روده دراز یاوه‌گو؛ ۴) کشیدن عضلات برای رفع خستگی؛ ۵) توزین کردن.

**ڤه‌کێشك:** ته‌زوُ، مچوڕك ف تیرکشیدن اندام.

**ڤه‌گاڵیان:** راچڵه‌کین، داچڵه‌کین، داچڵه‌کان ف یکه‌خوردن.

**ڤه‌گر:** که‌سێ که ده‌ست به‌خه‌رجه‌وه ده‌گرێ، پاشه‌که‌وت‌که‌ر ف صرفه‌جو.

**ڤه‌گـرت:** ۱) خێوه‌تی هه‌ڵـدا؛ ۲) چیغی رائـه‌نگـاوت ف ۱) خیمـه را برپاکرد؛ ۲) چیغ پیرامون خیمه را گرفت.

**ڤه‌گرتن:** ۱) کاری ڤه‌گر، پاشه‌که‌وت‌کردن؛ ۲) هه‌ڵدانی چادر؛ ۳) گرتنی نه‌خوّشی له نه‌خوّشێکی تر؛ ۴) رائه‌نگاوتنی چیغ ف ۱) صرفه‌جویی؛ ۲) برپاکردن خیمه؛ ۳) بیمارشدن از واگیری؛ ۴) با چیغ پیرامون را گرفتن.

**ڤه‌گرتی:** داگیرکراو، ئه‌ستێندراو ف غصب شده.

**ڤه‌گری:** ڤه‌گرتن ف صرفه‌جویی.

**ڤه‌گڤاشتن:** توندگوشین، به‌نهێم‌کوشین، له‌زه‌بروشین ف محکم فشردن.

**ڤەگۆتن:** های لە نادیاردان، قسە لە کاری دواڕۆژ کردن ف پیش‌بینی.

**ڤەگورزین:** بەگورجی و بە لەز هەڵاتن، چالاکانە ڕاکردن ف شتابان گریختن.

**ڤەگوهارتن:** گۆڕینەوە، شت بەشت‌دان ف معاوضه.

**ڤەگوهاستن:** ڕاگوێزان، لەشوێنێك بۆ شوێنی‌تر چوُن ف انتقال.

**ڤەگوهشین:** خۆلەکاردزینەوە، تەمەڵی کردن ف اهمال و سستی.

**ڤەگەڕ:** ١) زڤڕین، وەگەڕان؛ ٢) شوێن‌گێڕ ف ١) بازگشت؛ ٢) پیگرد.

**ڤەگەڕاندن:** ١) زڤڕاندن؛ ٢) دانەوەی وام؛ ٣) گێڕانەوەی ڕوداو ف ١) بازگرداندن؛ ٢) ادای وام؛ ٣) بازگوکردن.

**ڤەگەڕیان:** زڤڕینەوە ف بازگشتن.

**ڤەگەڕین:** گەڕانەوە، دوای ڕۆیشتن هاتنەوە ف برگشتن.

**ڤەگەز:** چزوی دوپشك‌و مار ف نیش عقرب و مار.

**ڤەگەزاندن:** پێوەدانی مارو دوپشك ف گزیدن مار و عقرب.

**ڤەگەشین:** ١) خۆشبوُنی ئاگر؛ ٢) بەپوڵوُبوُنی ڕەژی؛ ٣) شەق‌و تورت‌بوُن؛ ٤) بوُژانەوە ف ١) مشتعل شدن آتش؛ ٢) اخگرشدن زغال؛ ٣) شکوفاشدن؛ ٤) سرحال آمدن بعد از پژمردگی.

**ڤەگەڤزاندن:** مل‌دەبەرمل‌نان، یەکتر لەزەوی‌دان ف گلاویز شدن.

**ڤەگەڤزین:** تل‌دان لەسەر زەوی ف غلتیدن بر زمین.

**ڤەگەمزین:** بازبردنی بەتەوژم، پەڕین ف جهش، پرش.

**ڤەگێڕان:** ڤەگەڕاندن ف نگا: ڤەگەڕاندن.

**ڤەل:** بل، نەرم‌بوی ڕەق ف سفت نرم شده.

**ڤەلا:** تازیانە، شەلاخ، قامچی ف تازیانه.

**ڤەلۆ:** پشکنین، تۆژین، گەڕان بەشوین... ف تفتیش.

**ڤەلۆکرن:** پشکنین، لێ‌گەڕان ف تفتیش کردن.

**ڤەلیستن:** لێستنەوە، بەزمان خاوێن کردنەوە ف لیسیدن.

**ڤەمال:** دەس‌پێداهێنی ئەندام، کەسێ خەڵك دەشێلێ بە دەست ف ماساژدهنده.

**ڤەمالین:** دەست بەلەشاهێنان بەتەوژم، شێلانی پشت‌و ئەندام ف ماساژدادن.

**ڤەمان:** بەجێ‌مان ف واماندن، جاماندن.

**ڤەمای:** بەجێ‌ماو ف وامانده، جامانده.

**ڤەمران:** خامۆش‌بوُنی ئاگر، کوُژانەوە ف خاموش شدن آتش.

**ڤەمراندن:** خامۆش کردنی ئاگر، کوُژاندنەوە ف خاموش کردن آتش.

**ڤەمرتن:** ١) ڕەنگ‌زەرد هەڵگەڕان؛ ٢) لاوازبوُن ف ١) رنگ زردشدن؛ ٢) لاغرشدن.

**ڤەمرتی:** ئاگری خامۆش‌بوُگ، کوُژاوە ف آتش خاموش شده.

**ڤەمری:** کوژایەوە، ئاگرنەما: (چرا **ڤەمری**، **ئاگر ڤەمری**) ف خاموش شد.

**ڤەمرین:** ڤەمران ف نگا: ڤەمران.

**ڤەمزتن:** هەڵقوڵینی ئاو، دەرپەڕینی ئاو لەزەوی ف جوشیدن آب از زمین.

**ڤەمژین:** مژلێدان، مژین ف مك‌زدن، مکیدن.

**ڤەمستن:** هەڵقوڵین، ئاو لە کانی دەرپەڕین ف جوشیدن آب از چشمه.

**ڤەمشتن:** ١) ڤەمژین؛ ٢) باسك‌و دەلنگ هەڵماڵین؛ ٣) مشت‌وماڵ کردن ف ١) مکیدن؛ ٢) ورمالیدن؛ ٣) صیقل دادن.

**ڤەمەرقین:** ١) شەکەت‌بوُن؛ ٢) پڕبوُن‌و سەرڕێژکردن لە تراو ف ١) بسیار خسته‌شدن؛ ٢) لبریزشدن از مایع.

**ڤەمێتن:** ڤەمژین ف مکیدن.

**ڤەناسین:** ١) وەبیرهاتنەوە، ناسینەوە؛ ٢) مکوڕبوُن، پێ‌هاتن ف ١) بازشناختن؛ ٢) اقرارکردن.

**ڤەناندن:** ١) هیم‌دانان، بناغەدارژتن؛ ٢) وەدی‌هێنان؛ ٣) سەعات قورمیش کردن ف ١) پایەریزی کردن، اساس نهادن؛ ٢) ایجاد کردن؛ ٣) کوك کردن ساعت.

**ڤەنژین:** گەشەکردن، بەخۆداهاتن ف شکوفاشدن.

**ڤەنشتن:** ١) لە فڕین بەس کردن، نیشتنەوەی باڵدار؛ ٢) چوُنەخواری تلتە؛ ٣) پوُچانەوەی پەنەماو ف ١) نشستن پرنده؛ ٢) تەنشین شدن؛ ٣) خوابیدن ورم.

**ڤەنشتی:** ١) لە فڕین بەس کردگ؛ ٢) نیشتوی تلتە؛ ٣) پوُچاوە ف ١) پرندهٔ نشسته؛ ٢) تەنشین شده؛ ٣) ورم از بین رفته.

**ڤەنشین:** ئۆقرە ف آرامش.

**ڤەنوسکاندن:** لکاندن، چەسپاندن، نوساندن ف چسباندن.

**ڤەنوُسین:** ١) پێوەنوُسان؛ ٢) تێ‌هەڵسوُن ف ١) چسبیدن؛ ٢) رنگ‌زدن.

**ڤەنهرین:** ڕاپەڕین لە پڕا، بڵندبوُن لە نکاو ف پریدن و برخاستن، ازجا پریدن.

**ڤەنهشتی:** ئۆقرەگرتو، ئارام‌بوُگ ف آرام‌گرفته.

**ڤەنهێڕان:** دیسان تواشاکردن ف بازنگاه کردن.

**ڤەنهێڕاندن:** ڤەنهێڕان ف بازنگاه کردن.

**ڤەنهێڕین:** ڤەنهێڕان ف بازنگاه کردن.

**ڤەنی:** بەری دارەبەن، قەزوان، کەسکان ف ثمر درخت سقز.

**ڤەنیشتن:** ڤەنشتی ف نگا: ڤەنشتی.

**ڤەور:** بەفر ف برف.

**ڤەوەراندن:** نیشان‌دان، ڕوُن‌کردنەوەی مەبەستێك ف تفهیم کردن.

**ڤەوەژارتن:** ١) بژاردنی دانەوێڵە؛ ٢) خاوێن‌کردنەوەی زەوی کێڵگە لەبەرد، بەردبژاردن ف ١) پاك کردن غلات از دانهٔ ناباب؛ ٢) جمع‌کردن سنگ از زمین زراعتی.

**ڤەوەشاندن:** فڕێ‌دان، توُڕهەڵدان ف پرت کردن.

**ڤەوینی:** ئاکار، ڕەوشت، کردەوە ف اخلاق.

**ڤەهاتن:** ١) هەڵاتنی هەویر، سەرکەوتنی هەویر؛ ٢) سەردەرێنانی ڕوەك لە زەوی؛ ٣) نەخۆشی لەسەروبەندی چاك‌بوُنەوە؛ ٤) پەشیمانی ف ١) برآمدن خمیر؛ ٢) بردمیدن نباتات؛ ٣) اواخر بیماری؛ ٤) پشیمانی.

**ڤەهاڕین:** وردکردنی وەك تۆز، کردنەئارد ف ساییدن، آردکردن.

**ڤەهاندن:** گێڕانەوەی قسەو چیرۆك ف بازگوکردن.

**ڤەهسیان:** حەسانەوە، سانەوە ف آسودن.

**ڤەهلدان:** بەچاوهیماکردن، چاوداگرتن ف غمز.

**ڤەهۆنان:** هۆندن، هۆندنەوە ف بافتن.
**ڤەهۆینان:** ڤەهۆنان ف بافتن.
**ڤەهەڕاندن:** عالەپەزکردن بۆ ئاو خواردنەوە ف نهیب بر گلەزدن برای آب خوردن.
**ڤەهەژاندن:** راتلەکاندن ف تکان دادن، جنبانیدن.
**ڤەهێڕان:** ڤەهاڕین ف نگا: ڤەهاڕین.
**ڤەهێڕاندن:** ڤەهاڕین ف نگا: ڤەهاڕین.
**ڤەهێڕیای:** وردکراو وەك تۆز ف ساییده، گردشده، پودر.
**ڤەهێشت:** بەهەشت ف بهشت.
**ڤەهێلان:** تەرك کردن، بەجێ هێشتن ف ترك کردن.
**ڤەهێلای:** بەجێ هێلراو، تەرك کراو ف متروك، جامانده.
**ڤەهینان:** ڤەهۆنان ف بافتن.
**ڤەیتۆن:** ئاگردانی گەرماو، تۆنی حەمام ف آتشدان حمّام.
**ڤی:** ئەو بۆ نێر ف آن برای مذکّر، او.
**ڤێ:** ١) ئەو بۆ مێوینە؛ ٢) هەڵبوی ئاگر؛ ٣) ناوی پیتێکی ئەلفو بێتکە ف ١) آن برای مؤنث، او؛ ٢) مشتعل؛ ٣) نام حرف «ڤ» از حروف الفبای زبان کردی.
**ڤیاد:** زرعاتی شەختەلێدراو ف کشت سرمازده.
**ڤیار:** زەوی لەبەر سەرماو سوڵە هەڵتەکاو ف زمین از یخ‌بندان سست شده.
**ڤیان:** عیشق، دڵداری ف عشق و محبّت.
**ڤیت:** قوت، قیت: (گوهێ مشك **ڤیتن**) ف برجسته.
**ڤێت:** پاشگر بەواتا: ویستن ف پسوند به معنی خواستن.
**ڤێتن:** ئارەزوکردن، بەئاوات‌خواستن ف آرزوکردن.
**ڤێجا:** ١)دەی سا؛ ٢) دەئەگەر وایە ف ١) پس اینطور؛ ٢) حال که چنین است.
**ڤیچ:** فیچ، خوار ف کج.
**ڤیچك:** چلم، ئاوی لوت ف آب بینی.
**ڤیچەکی:** نەخۆشیەکی ئاژاڵە مرخەمرخ لە گەروێ دێت ف نوعی بیماری وام.
**ڤێخستن:** ١) پێوە داڵەقاندن؛ ٢) هەڵکردنی ئاگرو چرا ف ١) آویزان کردن؛ ٢) روشن کردن آتش.
**ڤی دەرێ:** ئەیرە، ئێرە، ئێروکانە ف اینجا.
**ڤێ دەری:** هۆوەندە، ئەینە ف آنجا.
**ڤێڕ:** ١) هێڕ، گێڕ، خوارو خێچ، چەوت‌و چەوێڵ؛ ٢) خێل ف ١) کج‌و کوله؛ ٢) لوچ.
**ڤێڕا:** دەگەڵ ف همراه.
**ڤیڕان:** ڕیانی تراو، گوشلە ف مدفوع آبکی.
**ڤیڕاندن:** فیڕاندن ف ریدن اسهالی.
**ڤێڕك:** روی کەوش‌و پێڵاو ف رویهٔ کفش.
**ڤێڕکە:** زگ‌چوون ف اسهال.
**ڤێڕگ:** پەرگەما ف نخ‌چین کنارهٔ گیوه.
**ڤێرە:** ئێرە ف اینجا.
**ڤێڕە:** پێڕا، ڤێڕا ف همراه.
**ڤێرێ:** ئەوێ، ئەوجێ ف آنجا.
**ڤیزار:** دادو هاوار بۆ دەفریا هاتن ف دادوفریاد و طلب کمك کردن.
**ڤیژك:** ١) گوشلە؛ ٢) دڵۆپەی میچ، دڵۆپەی بان ف ١) مدفوع آبکی؛ ٢) چکهٔ بام.
**ڤیس:** بیست ف عدد بیست.
**ڤێس:** جوێن، جنێو، دژمان، سخێف ف دشنام.
**ڤێسین:** جوێن‌دان ف دشنام‌دادن.
**ڤێڤراندن:** ١) راکێشان؛ ٢) بێ لەش‌پۆش، بێ لێفەو سەرەنازبون ف ١) کشیدن بر زمین؛ ٢) آسمان جُل.
**ڤێڤرین:** ئاشکرابون، زڕانی راز ف آشکارشدن، برملاشدن.
**ڤێك:** ١) پێکەوە؛ ٢) تەنکاو، ئاوێ کە قوڵ‌نیە ف ١) باهم؛ ٢) آب کم‌عمق.
**ڤێك‌ئێخستن:** خڕکردنەوەی بڵاو لە دەوری یەك ف جمع‌آوری پراکنده‌شده.
**ڤێك‌خستن:** فێك‌ئێخستن ف جمع‌آوری کردن.
**ڤێکدان:** ڤێك‌ئێخستن ف نگا: ڤێك‌ئێخستن.
**ڤێك کەفتن:** خوڵێکدان، تۆشی‌یەك‌هاتن ف برخورد.
**ڤێکەتن:** ١) پرس‌و تۆژینەوە؛ ٢) هەڵبونی ئاگر ف ١) پرس وجو، کنکاش؛ ٢) مشتعل شدن.
**ڤێکەفتن:** پرسیارو تۆژینەوە، ڤێکەتن ف کنکاش.
**ڤێگا:** دەس‌بەجێ، هەر ئیسە ف همین حالا.
**ڤێگاڤێ:** ١) ڤێگا؛ ٢)ئەوجار ف ١)حالا؛ ٢) آن هنگام.
**ڤێگاوێ:** ڤێگاڤێ ف نگا: ڤێگاڤێ.
**ڤێل:** ١) نزم، نەوی؛ ٢) تەنکاو؛ ٣) پەل ف ١) پست؛ ٢) تنك‌آب؛ ٣) کم عمق.
**ڤیڵك:** ١) کیسەی دەم‌تەنگ؛ ٢) گزی، گەڕ، فێڵ ف ١) کیسهٔ دهانه تنگ؛ ٢) حیله، مکر.
**ڤێڵك:** تورەکەی‌زارتەنگ ف کیسهٔ دهانه تنگ.
**ڤین:** ١) تاسە؛ ٢) عیشق، ئەڤین؛ ٣) قسەی بێ‌مانا: (**ڤرت‌و ڤین**) ف ١) آرزو؛ ٢) عشق؛ ٣) یاوه.
**ڤێن:** ئەمان، ئەوانە ف اینها.
**ڤینا:** ئەمە، ئەڤە ف این.
**ڤین‌ڤینۆك:** گنگنۆك، مرۆی گن ف نگا: گنگنۆك.
**ڤینك:** جگی حەیوانەکێوی ف قاب بزگوهی.
**ڤێنی:** ئائەمە ف این، همین.
**ڤێهانا:** ئائەمەتا، ئەوەتانێ ف این خودش است، اینهاش.
**ڤێهەنە:** ڤێهانا ف نگا: ڤێهانا.

**قا:** دەم، کات: (ئەو قا تۆ هاتبوی من لە ماڵ نەبوٌم) ف هنگام.

**قاب:** ۱) جگ؛ ۲) جێگەی جگ لە پادا؛ ۳) دەفری پەل، دەوری؛ ۴) سەحەنی نان‌خواردن؛ ۵) کالان؛ ۶) ئەندازە؛ ۷) بەرگی کتێب ف ۱) شتالنگ، قاب؛ ۲) قوزك پا؛ ۳) بشقاب، دوری؛ ۴) ظرف تریدخوری؛ ۵) نیام؛ ۶) اندازە؛ ۷) جلد کتاب.

**قابغ:** جێ باروت لە فیشەك ف پوکە.

**قابل‌جەوز:** ناوی شارێکی کوردە لەلای دیاربەکر ف ازشهرهای کردنشین در ترکیە.

**قابلۆخ:** ۱)سەرپۆشی دەفر؛ ۲) تێکوڵی هەرشتێ ف ۱) سرپوش ظرف؛ ۲) پوستە.

**قابڵۆخ:** جێ‌باروت لە فیشەك ف پوکە.

**قابلەمە:** بەرۆشی دەسکداری سەرپوش‌داری پچوُك ف قابلمە.

**قابڵەمە:** قابلەمە ف قابلمە.

**قابڵەمەکردن:** ۱) پینە بەسەرداگرتن؛ ۲) دیواری خشتی کاڵ بە کەرپوچ روکێش‌کردن ف ۱) پینە بررویەزدن؛ ۲) دیوار گلی را با آجر پوشانیدن.

**قابوُر:** سواڵەتە شکاو، ئەشکەولەت ف سفال شکستە.

**قابۆرە:** داری لەبەر کۆنی پواو ف درخت کهنسال پوسیدە.

**قابوُل:** پلوُسك ف ناودان.

**قابیل:** بەرکەتی، شیاو ف شایستە.

**قاپ:** ۱) قاب، جگ، میچ، چوُ؛ ۲) دەفری بەردەستان؛ ۳) بەلەك، پوُز؛ ۴)جێگەی جگ لە پادا، گوێزینگ؛ ۵) پاروُی زل؛ ۶) چوارچێوە؛ ۷) کالان؛ ۸) بەندی چیتك؛ ۹) قسەی بن‌شڕ؛ ۱۰) گاز بە ددان ف ۱) شتالنگ، قاب؛ ۲) ظرف غذاخوری؛ ۳) ساق پا؛ ۴) قوزك پا؛ ۵) لقمۀ بزرگ؛ ۶) قاب عکس، چهارچوب؛ ۷) نیام؛ ۸) بندِنی؛ ۹)حرف مفت؛ ۱۰) گاز با دندان.

**قاپاخ:** سەرپۆشی‌دەفر، سەردەڤك ف سرپوش ظرف.

**قاپار:** گەز، گاز، هەردو ڕێزەددان لێ‌توندکردن ف گاز با دندان.

**قاپارگە:** لای خواروی بەلەك،پشت گوێزنگ ف کمی بالای قوزك پا.

**قاپان:** ۱) خۆهەڵکێشان؛ ۲) ڕفاندن؛ ۳) تەرازوی زل؛ ۴) جگێن، میچێن؛ ۵) خۆ بەزل‌زان، بەفیزو دەعیە ف ۱) خودستایی؛ ۲) ربودن؛ ۳) باسکول؛ ۴) قاب‌بازی؛ ۵) متکبّر.

**قاپانە:** جگێن ف قاب‌بازی.

**قاپانی:** فیزو بادی‌هەوایی ف تکبّر.

**قاپانێ:** جگێن ف قاب‌بازی.

**قاپاوێژ:** مرۆ یان حەیوانێ کە لە ڕۆیشتنا قاپی پای وێك دەکەوێ ف انسان یا حیوانی کە هنگام راه‌رفتن قوزك پاها را بە هم میزند.

**قاپچی:** ۱) ڕفێن، شت‌ڕفێن؛ ۲) لە جگێن‌دا زانا؛ ۳) دەرکەوان ف ۱) رباینده؛ ۲) ماهر در قاب‌بازی؛ ۳) دربان.

**قاپڕەش:** ئەسپی کوێتی دامێن‌تاریك کە جومگەی دەستی ڕەش بێت ف اسب کمیت مچ دست سیاه.

**قاپشۆ:** کەسێ دەفر و ئیر باران دەشوا، برێتی لە کارەکەرو قەرەواش ف ظرفشوی، کنایە از کلفت و نوکر.

**قاپشۆر:** قاپ شۆ ف نگا: قاپ شۆ.

**قاپقاپ:** پێڵاوی لە دار ف دم‌پایی چوبین.

**قاپك:** پەنەمانی قاپی پا ف ورم قوزك پا.

**قاپکزێنە:** گیایەکە لە چێشت دەکرێ ف نوعی سبزی آش.

**قاپگر:** ۱) سەگێ کە پا دەگەزێ؛ ۲) برێتی لە مرۆی بەدفەڕ ف ۱) سگ گازگیر؛ ۲) کنایە از آدم موزی.

**قاپگرتن:** ۱) پاگەزتن؛ ۲) برێتی لە کێشەتێ‌هاڵاندنی بەخۆڕایی؛ ۳) دەچوارچێوەگرتن، قاب‌کردنی عەکس ف ۱) پاگزیدن؛ ۲) کنایە از دبەدرآوردن بدون سبب؛ ۳) در چهارچوب گذاشتن.

**قاپۆ:** ۱)ئاوماڵك، ئەوشتانەی لافاو ڕای‌داون‌و خستونیە کەنار چەم؛ ۲) نیاز، ئاتاجی ف ۱) سیل‌آورد؛ ۲) احتیاج.

**قاپوُت:** ۱) فەرەنجی؛ ۲) باڵتۆ؛ ۳) سێ‌جارە بردنەوەی‌یاری‌مەحبوُس لەنەردێندا ف ۱) بالاپوش نمدی؛ ۲) پالتو؛ ۳) سوم برد در بازی

محبوس تختەنرد.
**قاپوچکە:** ١) دەفری زۆر پچوك؛ ٢) پاروی نان بۆ ماست پیٚهەڵگرتن: (لە کۆزی کاران بڕوانەو **قاپوچکە** لە ماست داگرە) «مەسەل» ف ١) ظرف کوچولو؛ ٢) لقمهٔ نان برای ماست برداشتن.
**قاپۆڕ:** قابلۆخ ف پوکە.
**قاپۆڕە:** قابۆرە ف درخت کهنسال پوسیده.
**قاپوقاچاخ:** دەفر بە گشتی ف ظروف عموماً.
**قاپوقاچاغ:** قاپوقاچاخ ف ظروف عموماً.
**قاپوقاپۆڕ:** خرتوپرتی ماڵ ف خرت و پرت اثاثیه.
**قاپوقنجاڕ:** قاپو قاچاخ ف ظروف خانگی.
**قاپۆك:** قاپۆ ف سیل‌آورد.
**قاپولکە:** قاپوچکە ف نگا: قاپوچکە.
**قاپولە:** قاپی پا، گوێزنگ ف قوزك پا.
**قاپە:** ئاخافتنی زلەزلەو بیٚ مانا ف حرفهای گنده و نامفهوم.
**قاپەڕەقە:** سەری گوێزنگ ف سرقوزك پا.
**قاپەکەوڵە:** گیایەکە بۆ دەرمان دەشیٚ، قەیتەران ف گیاهی دارویی.
**قاپی:** ١) درگا؛ ٢) رفاندی ف ١) دروازە؛ ٢) ربود.
**قاپیلك:** تیٚخوڵی بەتاڵی شت:(قاپیلکەشوتی، **قاپیلکەهیٚلکە**) ف پوستهٔ توخالی.
**قاپیلکەسەر:** ئیٚسکەسەر، کەللەسەر ف جمجمە.
**قاپین:** رفاندن ف ربودن.
**قاپیٚن:** قاپانیٚ ف قاب‌بازی.
**قاپیوان:** دەرکەوان: (دەتوت تەمیٚ کراوە بەمەخسوسی **قاپیوان**/خۆی کرد بە نیٚرەترکو گوتی کیم بلر سزی؟) «شیٚخ‌رەزا» ف دربان.
**قاپیٚوان:** دەرکەوان ف دربان.
**قاپیە:** درگا ف دروازە.
**قاپیەوان:** دەرکەوان ف دربان.
**قات:** ١) ئەوەنـدە، لەئـەندازە، بەرانبەر: (دو **قات** چاکەی دامەوە)؛ ٢) نهـۆم: (خانوەکەی دوقاتە لە **قاتی** سەرەوە دانیشتوە)؛ ٣) دەست لە بەرگو نوین؛ ۴) شتیٚ کە بە کڕین دەست ناکـەویٚ؛ ۵) دەم، سات، کات: (ئەو قاتە لاو بوم)؛ ۶) مەیدانی جەنگو کایە؛ ٧) ناو دو تویٚ: (لـە **قاتی** کەوایدا بو)؛ ٨) خاك، زەوی ف ١) برابـر در اندازە؛ ٢) اشکوب، طبقهٔ ساختمان؛ ٣) دست از لباس و رختخواب؛ ۴) نایاب؛ ۵) هنگام؛ ۶) میدان؛ ٧) لایە؛ ٨) زمین، خاك.
**قاتانقوڕ:** ناوی گوندیٚکە ف نام روستایی است.
**قاتر:** ئیٚستر ف استر، قاطر.
**قاترچی:** خەربەندە ف چاروادار.
**قاترداشاغی:** ئاڵو بخارا، ئاڵوچەرەشە ف آلو بخارا.
**قاتغ:** سپیایی ف لبنیّات.
**قاتقات:** ١)تم‌تمـان، تم‌تم؛ ٢) نهـۆم لەسەر نهۆم ف ١) زمین سنگی توبرتو؛ ٢) چندطبقە.
**قاتڵ:** ١) ترش، مزر؛ ٢) پیاوکوژ ف ١) ترش‌مزە؛ ٢) قاتل.
**قاتم:** لیٚك بەستنی گیاندار ف بەهم بستن حیوانات.
**قاتمە:** ١) داوموسك، هۆندراو لە داوموسك؛ ٢) پریٚسکە؛ ٣) گلۆڵەبەن ف ١) قاتمە، دام از موی؛ ٢) پیرزە؛ ٣) گلولهٔ نخ.
**قاتمەبەن:** گشتەکی هۆندراو لە داموسك ف قاتمەبند، ریسمان مویین.
**قاتۆر:** تەختەی دارەڕا ف تختهٔ الوار.
**قاتـۆرك:** ١) لقی هەرەناسکی دار؛ ٢) لاسکی لاولاو، لەولاوکە گوڵی *جوان دەکا* ف ١) جوانهٔ بسیار نازك درخت؛ ٢) لبلاب.
**قاتوقڕ:** گرانیو گیرنەکەوتنی بژیو ف گرانی و نایابی خواربار.
**قاتوقڕی:** قاتوقڕ ف نگا: قاتوقڕ.
**قاتوقەیماخ:** نیوەنمەك ف خمیری کە برای نرم کردن بر دمل گذارند.
**قاتۆڵی:** ڕوبی هەنار ف رب انار.
**قاتـە:** ١) گوڵی داروجـان؛ ٢) داسولکەی خەلە؛ ٣) رازی؛ ۴) تیٚکوڵی چەڵتوك ف ١) خوشهٔ کدرم؛ ٢) پرزخوشهٔ غلّه؛ ٣) راضی؛ ۴) پوستهٔ برنج.
**قاتـەلیٚوە:** سەرەتـای بەهار کە تازە شینکە سەری دەریٚناوە، خاکەلیٚوە، ئاخەلیٚوە ف آغاز بهار، فصل دمیدن سبزە.
**قاتەولیٚوە:** قاتەلیٚوە ف نگا: قاتەلیٚوە.
**قاتی:** ١) دەس نەکەوتنی بژیو؛ ٢) تیٚکەڵاو؛ ٣) رازی ف ١) قحط و غلا؛ ٢) آمیختە؛ ٣) خوشنود.
**قاتیوقڕی:** قاتوقڕ ف نگا: قاتوقڕ.
**قاج:** کاژ، جۆریٚ داری گەڵادەرزیو هەمیشەسەوزە ف درخت کاج.
**قاجـر:** گونـدیٚکی کوردستـانـە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان کە توسط بعثیان ویران شد.
**قاجوج:** گلیٚنەی ئاوخواردنەوە ف لیوان سفالین.
**قاچ:** ١) دو، کلك؛ ٢) پا؛ ٣) پوزو بەلەك؛ ۴) بەردی بازەلیٚن؛ ۵) جگ؛ ۶) زەقایی، زۆپی؛ ٧) داریٚکی دڕکاویە ف ١) دُم؛ ٢) پا؛ ٣) ساق؛ ۴) شن بازی؛ ۵) قاب، شتالنگ؛ ۶) برجستگی؛ ٧) درخت خاردار.
**قاچاخ:** ١) بەچکەحوشتری دوساڵە؛ ٢) کاری دژی دەستوری دەوڵەت؛ ٣) کەسیٚ کاری دژی دەستـوری دەوڵەت دەکا؛ ۴) ماڵیٚ کە کڕینو فرۆشی بەرانبـەر بە دەستـوری دەوڵەت نیە؛ ۵) کەسیٚ کە لە ترسی دەوڵەت خۆی شاردۆتەوە؛ ۶) تۆراو، تاربوگ: (چەندیٚکە لیٚمان **قاچاخ** بوە)؛ ٧)ڕەوەك ف ١) شتر بچهٔ دوسالە؛ ٢) کار قاچاق؛ ٣) کسی کە کار خلاف قانون انجام دهد؛ ۴) اموال قاچاق؛ ۵) تحت تعقیب؛ ۶) غایب شدە؛ ٧) رموك.
**قاچاخچی:** فرۆشیاری ماڵی قاچاخ ف قاچاقچی.
**قاچاغ:** ١) قاچاخ؛ ٢) گامیٚشی دوساڵە ف ١) نگا: قاچاخ؛ ٢) گاومیش دوسالە.
**قاچـان:** ١) بزۆز، بیٚئارام؛ ٢)شتڕفیٚن؛ ٣) راکـردن ف ١) ناآرام؛ ٢) رباینده؛ ٣) دویدن.
**قاچاندن:** ١) رفاندن؛ ٢) راکردن ف ١) ربودن؛ ٢) دویدن.
**قاچانیٚ:** جگیٚن ف قاب‌بازی.
**قاچاو:** زەوینی دژاو ف زمین دارای نشیب و فراز کە آبیاریش دشوار

است.

**قاچك:** ۱) پاچەی حەیوان لە چێشتی سەروپێدا؛ ۲) خێزەرە؛ ۳) دوو، کلك؛ ۴) کارگ، قارچ؛ ۵) چەقـەی جاوین؛ ۶) چرپـی هەڵاشـی خانـوو،چـرۆی سەربـانـەڕا کە وەبن پۆش و پەلاش دەدرێ و قوڕەبان دەکـرێ ف ۱) پاچە؛ ۲) نگا: خێزەرە؛ ۳) دُم؛ ۴)قارچ؛ ۵) قندرون، نوعی سقز گیاهی؛ ۶) چوبکهای انبیره.

**قاچۆر:** پۆشانە حەساوکردن، ژمارەی ئاژەڵ نوسین بۆ باج ف سرشماری دام به قصد اخذ مالیات.

**قاچوق:** کەوچك ف قاشق.

**قاچوقۆچ:** سیرمەخۆری، شرەخۆری ف دلەدزدی.

**قاچوقول:** لنگ‌ولەتەر ف از زانو به پایین.

**قاچەشرمەکێ:** شەرەپێلاقە ف لگدبازی.

**قاچی:** ۱) تۆرتۆ؛ ۲) ڕووبەڕوو؛ ۳) پێڵاو، پاپۆش ف ۱) قیچی؛ ۲) روبرو؛ ۳) پای افزار.

**قاچین:** پاچین ف قیچی کردن.

**قاچێن:** ۱) بازەڵێن؛ ۲) جگێن ف ۱) شن‌بازی؛ ۲) قاب‌بازی.

**قاحبە:** جندە ف فاحشه.

**قاخ:** چەماو، داهاتو ف خمیده.

**قاخلی:** شمڵی ف کاجیره.

**قاخه:** قەدەغە ف ممنوع.

**قاد:** ۱) زەمین، هەرد؛ ۲) خاك، قات ف ۱) زمین؛ ۲) خاك.

**قاداشەڕی:** مەیدانی جەنگ ف میدان جنگ.

**قادر:** ۱) ناوی خودا؛ ۲) ناوە بۆ پیاوان ف ۱) نام خدا؛ ۲) نام مردانه.

**قادرالی:** گونـدێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**قادرمه:** ۱) پلەکان؛ ۲) نەردیوان ف ۱) پلکان؛ ۲) نردبان.

**قادڤین:** ئازا لە شەڕ ف شجاع.

**قادۆ:** ۱) سواوی ناوی قادر، ناوە بۆ پیاوان؛ ۲) قادڤـین ف ۱) مخفف قادر، نام مردانه؛ ۲) شجاع.

**قادۆل:** کوپەڵەی زارتەنگ، جەڕەو کوپەی جێ پەنیر ف بستوغه.

**قادی:** گەمەیەکی زاڕۆکانە ف نوعی بازی کودکانه.

**قادێ:** ۱) گۆڕەپان؛ ۲) مەیدانی کایە ف ۱) زمین هموار؛ ۲) میدان بازی.

**قادیانـه:** گونـدێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**قار:** ۱) تۆڕەیی؛ ۲) خەم؛ ۳) دەی فەقـێیان؛ ۴) جیرەی فەقـیران؛ ۵) سوکـەڵەناوی قادر؛ ۶) توانا، تاقەت: (ئەز قارم وێ کارێ بکەم)؛ ۷) گوندێکە لە لای سنە ف ۱) قهر؛ ۲) غم؛ ۳) نوعی تقسیم با انگشتان؛ ۴) جیرهٔ روزانهٔ فقرا؛ ۵) مخفف قادر نام مردانه؛ ۶) تاب وتوان؛ ۷) نام روستایی در سنندج.

**قاڕ:** ۱) ئارام، تۆقرەگرتو؛ ۲) دەنگی بەرزی باڵدارو پەز؛ ۳) نانی تۆپێن ف ۱) آرام؛ ۲) صدای بم پرنده و گوسفند؛ ۳) با چوب یکبار به توپ بازی زدن.

**قارا:** ئۆقرە، ئارام: (ئاراو قارای نەما)، دوای ئارا دەڵێن ف تسکین، آرامش.

**قاراغ:** کەنار، قەراغ ف کنار، گوشه.

**قاڕان:** قاڕ، دەنگی زلی باڵندەو پەز ف صدای بم پرنده و گوسفند.

**قاڕاندن:** ۱) دەنگ‌بەرزکردنی پەز؛ ۲) گارەکردنی مریشك ف ۱) صدای گوسفند؛ ۲) صدای مرغ.

**قاراوا:** گونـدێکی کوردستـانـە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**قارپچۆك:** داڵگۆشتی بێ‌تابشت ف لاغر مردنی.

**قارپوز:** ۱) خرچەی گەیشتو، گندۆرە، کاڵەك؛ ۲) سەرکڵاوەی لامپا ف ۱) خربزه؛ ۲) آباژور.

**قارپۆز:** زۆبی پێشەوەی زین ف کوههٔ زین.

**قارچ:** قاچ، کوارگ، کارگ ف قارچ.

**قارچك:** ۱) قارچ؛ ۲) ئێسقانی کلینچك، پێشەی جوچکەسمت ف ۱) قارچ؛ ۲) دمغازه، دنبالچه.

**قارچکەگولانه:** جۆرێ قارچ کە بۆ خواردن ناشێ ف قارچ سمّی.

**قارچکەمارانه:** جۆری قارچ، قارچکەگولانە ف قارچ سمّی.

**قارخ:** دوکانۆکەی سەوزی تێداچاندن ف کرد سبزیکاری.

**قارژنگ:** جانەوەرێکی ئاوی‌یە بەندبەندە بە دوسەرە دەڕوا ف خرچنگ.

**قارس:** ۱) تووڕە؛ ۲) جاڕز؛ ۳) دادروون بۆ کورت‌کردنـەوە؛ ۴) شارو مەڵبـەنـدێکـە لە کوردستان ف ۱) خشمگین؛ ۲) پکر؛ ۳) بردوختن برای کوتاه‌کردن؛ ۴) شهر و ناحیه‌ای در کردستان.

**قارسبوون:** ۱) جاڕزبوون؛ ۲) کورت‌بوونەوە بە دادروون ف ۱) پکرشدن؛ ۲) کوتاه‌شدن از دوخت.

**قارس‌کردن:** ۱) جاڕزکـردن؛ ۲) کورت‌کردنـەوە بە دورمان ف ۱) پکر نمودن؛ ۲) کوتاه کردن بوسیلهٔ دوخت.

**قارسەقول:** تەرسەقول ف مدفوع ستور.

**قارسی:** ڕۆژی قیامەت، ڕۆژی سەڵا، پەسڵان ف روز رستاخیز.

**قارغ:** لەڕۆژدا تاریك، دوورەتاو ف اتاق در روز تاریك.

**قاڕقاڕ:** دەنگی زلی باڵدار ف قارقار پرنده.

**قارقارائا:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**قاڕقاڕۆ:** زیقەزیق‌کەر ف جیغ‌کش، جیغ‌جیغو.

**قاڕقاڕۆك:** ۱) قارپچۆك؛ ۲) قالاو، قەلەڕەشە؛ ۳) مرۆ یا باڵدارێ کە زۆر دەقیرنێ؛ ۴) کەسێ کە بۆ شت‌فرۆشتن هەرا دەکا ف ۱) لاغرمردنی؛ ۲) کلاغ؛ ۳) انسان یا مُرغی که زیادجیغ می‌کشد؛ ۴) کسی که برای فروش کالایش فریاد می‌زند.

**قارقـاره:** لەتە سەهۆڵی دەگەڵ لافاوی بەهار ف تکه‌های یخ شناور در سیلاب بهاری.

**قاڕقاڕه:** جۆرێ چەرخ بۆ کایەی منداڵان ف نوعی چرخ برای بازی بچه‌ها.

**قارقومه:** گیایەکە دەیخۆن ف گیاهی است خوردنی.

**قارم:** دەتوانم،لە دەسم دێت ف می‌توانم، از دستم برمی‌آید.

**قارن:** دەتوانن، لەدەسیان دێت ف می‌توانند، از دستشان برمی‌آید.

**قارْن:** زۆر بەزیقەزیق ف جیغ‌کش و جنجالی.

**قارنا:** گوندێکە لە کوردستان ف از روستاهای کردستان.

**قارنان:** پنتی، رژد، چکوُس، چکوُد، ڕەزیل، سەقیل ف خسیس.

**قارْنج:** ١) پەراوێزی بەرگ‌و شمەك؛ ٢) بەنی بابۆڵەپێچ ف ١) سجاف؛ ٢) بند قُنداق‌پیچ.

**قارْنجە:** ١) قارْنج؛ ٢) ناوی دێیەکە لە کوردستان ف ١) نگا: قارْنج؛ ٢) نام دهی است.

**قارْنگە:** شار لە یاری تۆپێن‌دا ف سر میدان توپ‌بازی با چوب.

**قارْنە:** ١) تۆپەراکردێن؛ ٢) ناوی دێیەکە ف ١) نوعی توپ‌بازی؛ ٢) نام دهی.

**قارۆت:** کلافەدەزوُ ف کلاف نخ.

**قاروُچ:** قارپچوُك ف لاغر مردنی.

**قاروُش:** گیایەکە ف گیاهی است.

**قاروُشاوی:** جێگەیەکە قاروُشی زۆر لێ ڕواوە ف «قاروُش»زار.

**قاروُشە:** گەسك لە چیلکەدار،گزگ، لە توُڵ ف جاروی ترکەای.

**قاروُشەلاّن:** قاروُشاوی ف «قاروُش»زار.

**قارْوقوُرْ:** دەنگی تێکەلاّوی مەڕو بزنی زۆر ف غوغای گلە.

**قارْوُعەم:** زۆر لەڕو لاوان، داڵ‌گوشت ف لاغر مردنی.

**قارْوُن:** ١) ناوی دەوڵـەمـەنـدێکی کەونارا بوە؛ ٢) برێتی لە مرۆی زۆر دەوڵـەمـەند: (کابرا وەك ئارْون‌و **قارْون** وایە)؛ ٣) بێشەو زەمەند؛ ۴) زۆر، زەحف ف ١) قارون؛ ٢) کنایە از ثروتمند بزرگ؛ ٣) بیشە و نیزار انبوه؛ ۴) زیاد.

**قارونە:** ١) کرمی میوەی وشك؛ ٢) جانەوەری وردی جلکی‌خوری‌خوْر ف ١) کرم میوه؛ ٢) بید، حشرهٔ پشم‌خوار.

**قارْە:** ١) دەنـگـی هاواری پەزو باڵــنـــدە؛ ٢) تۆپێنی بەدار؛ ٣) گێژی: (قــارْەی سەری دێ) ف ١) صدای بلند گوسفند و پرنده؛ ٢) نوعی توپ‌بازی؛ ٣) گیجی.

**قارْەقــارْ:** ١) قارْقارْ؛ ٢) دەنگی تێکڕایی پەز، کارەکارْ ف ١) قارقار؛ ٢) صدای دسته‌جمعی گوسفندان.

**قارەمان:** ١) پاڵەوان؛ ٢) ناوە بۆ پیاوان ف ١) قهرمان؛ ٢) نام مردانه.

**قارەمانی:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**قارەوانــە:** جۆرێ دەفری پچوُکی مسی بۆشێوتێکردن ف نوعی ظرف کوچك مسی.

**قاری:** مرۆی‌قورعان‌خوێن ف قاری قرآن.

**قارْی:** پیرێژنی فەرْتوُت ف پیرزن لکنته.

**قارْێ:** قارْە، تۆپی بەدار ف نوعی توپ‌بازی با چوب.

**قاریت:** قاپچوُك ف لاغر مردنی.

**قاریش:** کەمەربەندی چەرمین، پشتێنی لە چەرم، قایش ف کمربند چرمی.

**قارین:** توانین، لەدەس‌هاتن ف توانستن.

**قاز:** باڵدارێکی سپی زەلامە گۆشتی دەخورێ سۆبایی کەرێکی چێیە ف غاز.

**قازاخ:** ١) پاك، خاوێن؛ ٢) زەریف، پەسند؛ ٣) چەکداری دەوڵەت؛ ۴) عازەب ف ١) پاکیزه؛ ٢) زیبا؛ ٣) قوای نظامی دولت؛ ۴) مجرّد.

**قازان:** ١) بەرۆش؛ ٢) سوُد، بەهــرەی داوستــەد؛ ٣) لەو گونـدانـەی کوردستــانــە کە بەعسی کاولیان کرد ف ١) دیگ، پاتیل؛ ٢) سود تجارت؛ ٣) روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**قازانج:** بەهرەی سەودا ف نفع معامله.

**قازانج کردن:** بەهرەگیرهێنان ف بهره‌بردن.

**قازانچە:** بەرۆشی چکۆڵە ف دیگ مسی کوچك.

**قازان‌قایە:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در گردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**قازانقوڵفی:** دەرزی بەرکۆژە ف قزن‌قفلی.

**قازانقوڵی:** قازانقوڵفی ف قزن قفلی.

**قازانگ:** قازان، بەرۆش ف دیگ مسی.

**قازانلی:** ناوی گوندێکە لە کوردستان ف نام روستایی است.

**قازانەسەر:** ١) دێوی خەیاڵی کە مناڵی پێ دەترسێنن؛ ٢) ناوی دێیەکە لە کوردستان ف ١) موجود خیالی برای ترساندن بچه؛ ٢) نام دهی در کردستان.

**قازاو:** دوگوندی کوردستان بەم ناوە بەعسی کاولی کردوە ف دو روستا به این اسم در کردستان توسط بعثیان ویران شده است.

**قازفرْەفرْ:** گەمەیەکە منداڵان دەیکەن، گاڵتەیەکی زارۆکانە ف نوعی بازی کودکان.

**قازڤان:** شوانی قاز، ئاگاداری باڵندەی قاز ف غازبان.

**قازْك:** مەنجـەڵی پچـوُکی قوڵف‌دار، بەرۆشی پچوُکی بەدەسك ف دیك کوچك دسته‌دار.

**قازلاّخ:** کلاّوکوُرْە، سوُفیەقیتە، *باڵدارێکی پچوُکە* ف پرنده‌ای کوچك.

**قازلاّخی:** قازلاّخ ف نگا: قازلاّخ.

**قازم:** بەن لە کوُرو، ریس لە توُکەوردی بن خوری ف ریس از کرك.

**قازمانە:** جۆرێ ئاڵوُچە ف نوعی آلو.

**قازمە:** پاچی زەوی کەندن ف کلنگ زمین کندن.

**قازمەکی:** بەرێکی پچوُکی دارمازو ف ثمری ریز از مازوج.

**قازەلاّخ:** قازلاّخ ف نگا: قازلاّخ.

**قازەلاّخی:** قازلاّخ ف نگا: قازلاّخ.

**قازەن:** دەسك‌و گوڵ لە چەڵتوُك‌جارْ ف دسته‌کردن خوشهٔ شالی.

**قازەوان:** شوانی قاز ف غازچران.

**قازی:** کەسێ کە بە پێك‌هێنانی ڕێوشوێنی ئاینی ڕادەگا ف قاضی.

**قازیاخە:** گیایەکە ئەخورێ ف قازایاغی، گیاهی است.

**قازیانە:** قازیاخە ف قازایاغی.

**قازیاوا:** ناوی دوگوندە لە کوردستان، یەکیان بەعسی وێرانی کرد ف نام دو روستا در کردستان که یکی را بعثیان ویران کردند.

**قاژ:** ۱) باڵدارێکی ڕەشـە لە کۆتر پچوکترە گۆشتی دەخورێ؛ ۲) ئەو شوشەو بەردەی دەسەری ئەنگوستیلە دەکرێ، نقێم، قاش؛ ۳) برۆ ف ۱) زاغ پاقرمز؛ ۲) نگین؛ ۳) ابرو.

**قاژدەرە:** باڵداری قاژ ف زاغ پاقرمز.

**قاژڕ:** زاروی زۆر گرینۆك ف بچهٔ بسیار گریان.

**قاژقاژە:** ڕەنگاڵە، ڕەنگرێژە، میش‌خۆرە، باڵدارێکە ف مرغکی است رنگارنگ.

**قاژك:** ۱) چەقەی جاوین؛ ۲) جاچکە، بنێشت؛ ۳) قەوچە، دەم‌لێکدان ف ۱) سقزبُنه؛ ۲) آدامس؛ ۳) بازوبسته‌شدن دهن ماچه‌خر.

**قاژکچوُن:** قەوچـەکـردن، دەم‌لێکدانی ماکەر لەژێر نێرەکەردا ف دهان بازوبسته‌کردن ماچه‌خر وقت جفتگیری.

**قاژوُ:** پەرندەی قاژ ف زاغ پاقرمز.

**قاژە:** ۱) دەنگی قاژوُ؛ ۲) دەنگی بەرکی ئاوێژراوی تفنگ ف ۱) صدای زاغ پاقرمز؛ ۲) صدای پرش گلوله.

**قاژەقاژ:** دەنگی زۆری قاژوُ ف صدای زیاد زاغ پاقرمز.

**قاژی:** ۱) قاژوُ؛ ۲) قازی چیا ف ۱) زاغ پاقرمز؛ ۲) غاز وحشی.

**قاس:** ۱) ئەنـدازە؛ ۲) دەم، سات: (ئـەو **قاس** چاڤنێری تە بوم) ف ۱) اندازه؛ ۲) آن، دم.

**قاسپە:** دەنگی خوێندنی کەو ف صدای کبك.

**قاسپەقاسپ:** قاسپەی لەدوی‌یەك ف صدای کبك پیاپی.

**قاسـریش:** دوگونـدی کوردسـتـان بەم ناوە بەعسی کاولی کردوە ف دو روستا به این اسم در کردستان توسط بعثیان ویران شده است.

**قاسك:** لاسکی گیا،نێوان بن‌و گوڵی گیا ف ساقهٔ گیاه.

**قاسم:** ناوی پیاوانە ف نام مردانه.

**قاسماوا:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**قاسناخ:** پێوانەیەکی خەلە بەرانبەر بە سی‌و دو کیلۆ ف پیمانهٔ غلّه برابر سی‌ودوکیلو.

**قاسناغ:** قاسناخ: (قەت لە یەك **قاسناغە** جوی کەم نادەمێ هێشتا لەڕە /ساڵ دوازدەی مانگێ سواری نابم‌و هەر ماندوە) «شێخ‌رەزا» ف نگا: قاسناخ.

**قاسە:** ۱) سواوی ناوی قاسم؛ ۲) سندوقی لە پۆلا بۆ پارە تێدا هەڵگرتن ف ۱) مخفف نام قاسم؛ ۲) گاوصندوق.

**قاسید:** مرۆی ڕەوانەکراو بۆ کارێك ف پیك، قاصد.

**قاش:** ۱) پێلە، کەوانە، پەل وەك نیوەجەغز؛ ۲) بڕیەك لە میوەی بێستان؛ ۳) قاژی ئەنگوستیلە؛ ۴) پان‌پانۆکە ف ۱) نیم دایره؛ ۲) برش از میوهٔ پالیزی، قاچ؛ ۳) نگین؛ ۴) مساحقه، طبق‌زدن.

**قاشاخ:** ۱) ڕنەك؛ ۲) لاسکی گەنمەشامی؛ ۳) گیایەکە لە کەنگر دەکا ف ۱) قشو؛ ۲) ساقهٔ بلال؛ ۳) گیاهی است شبیه کنگر.

**قاشاغ:** ڕنەکی یەکسم ف قشو.

**قاشاو:** قاشاغ ف قشو.

**قاش‌پاشا:** گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**قاشتی:** گونـدێکی کوردسـتـانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**قاش‌قاشـا:** لەو گونـدانـەی کوردسـتـانـە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویرانی کردند.

**قاشقی:** گونـدیکی کوردسـتـانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**قاشك:** ۱) تیخوڵی دار؛ ۲) پرزەی دار ف ۱) پوستهٔ درخت؛ ۲) الیاف درخت.

**قاشگ:** پەترۆك، پەترۆ، قرتماخەی سەربرین ف کبرهٔ زخم.

**قاشل:** تێخوڵ، تۆکڵ ف پوسته، قشر.

**قاشم:** گیایەکی بۆن‌خۆشە ف گیاهی است خوشبوی.

**قاشنە:** جۆرێ ماسی پوڵەکەزەرد ف نوعی ماهی.

**قاشوَ:** ۱) داری سەرچەماو بۆ گۆبازی؛ ۲) شەقەمێو ف ۱) چوگان گوی بازی؛ ۲) تنهٔ تاك.

**قاشوان:** بازی گۆیێن ف گوی بازی.

**قاشوانێ:** قاشوان ف گوی بازی.

**قاشوخ:** کەچك ف قاشق.

**قاشوُل:** قاشل، تێکوڵ ف پوسته.

**قاشوُلکە:** ورتکەسواڵەت‌و چینی بۆ کایەی منالان ف چینی و سرامیك و سفال شکسته که بازیچهٔ کودکان است.

**قاشوُلە:** قاشوُلکە ف نگا: قاشوُلکە.

**قاشە:** قاشنە، سوُرەماسی، قەشەماسی ف نوعی ماهی.

**قاعیدە:** ڕێوشوێن، دام‌و دەستوُر ف روش.

**قاعیم:** توند، پتەو ف محکم.

**قاغز:** ئامرازی سپی‌و تەنك بۆ خەت‌دان، قاقەز ف کاغذ.

**قاغنات:** فرچك، فرۆ، فرێشك، ژەك ف آغوز.

**قاغەز:** قاغز، قاقەز ف کاغذ.

**قاغەنەك:** قاغنات ف آغوز، فله.

**قاف:** ۱) دەنـا ئەوە چیە؟، مەتـەڵ؛ ۲) خڕی ئێسکی سەر، کەللە؛ ۳) دەرفەت؛ ۴) چیایەکی خەیاڵی؛ ۵) دەنگ‌دانی خەڵك بەتێکڕایی؛ ۶) ناوی پیتێکی ئەلف‌و بێکـە؛ ۷) لەجێ، منـاسبی جێ: (قسەکەت لە **قافی** خۆی‌دا بو) ف ۱) چیستان، معمّا؛ ۲) جمجمه؛ ۳) فرصت؛ ۴) کوه‌قاف؛ ۵) بسیج؛ ۶) نام حرفی در الفبا ۷) بجا، به‌مورد.

**قاف‌قلوُر:** ۱)قاپ‌و قاچاغی لە سواڵەت؛ ۲) برێتی لە حەپۆلی کەم‌فام ف ۱) ظروف سفالین؛ ۲) کنایه از تهی مغز.

**قافـك:** ۱) ئەشکـەولـەت، سواڵـەتـەشکـاو؛ ۲) سواڵەتی لەقاڵب‌دراو بۆسەربان داپۆشین؛ ۳) قاپۆڕی ڕەقەو کیسەڵ؛ ۴) کالان ف ۱) سفال شکسته؛ ۲) سفال‌بام؛ ۳) لاك لاك‌پشت؛ ۴) نیام.

**قافل‌قەدا:** قەزاو قەدەر ف قضا و قدر.

**قافلۆك:** دەفر و ئامانی گڵین، ئیرباری لەقوڕ ف ظرف سفالین.

**قافلە:** دەستەیەك لە بنیادەم‌و بارەبەر کە پێکەوە دەچنە سەفەر ف قافله.

**قافلی:** قاخڵی، کاخڵی، شمڵی[ف] کاجیره.

**قافۆ:** ئاوماڵك[ف] سیل آورده.

**قافوُ:** قافۆ[ف] سیل‌آورده.

**قافیه:** پاشڵی شێعر[ف] قافیه.

**قاڤ:** پوُشوُی دار[ف] پوسیدهٔ درخت که افروزنهٔ سنگ چخماق شود.

**قاڤـو:** ١) لاسکـەگیای ناوبـەتاڵ؛ ٢) ئاوماڵك، قافو[ف] ١) ساقهٔ گیاه میان‌تهی؛ ٢) سیل‌آورده.

**قاڤەرەش:** جۆرێ کەدو[ف] نوعی کدو.

**قاق:** ١) زوها، وشك، زڕ؛ ٢) گۆشتێ کە بۆ زستان وشك‌و خوێ کراوە[ف] ١) خشك؛ ٢) گوشت خشکیده.

**قاقا:** ١) حیلکەی پێکەنین، تریقە؛ ٢) نازناوی براگەورە؛ ٣) شتی خۆش لە زمـانی پچـوُکاندا[ف] ١) هرهر خنده، قهقهه؛ ٢) برادربزرگ؛ ٣) خوردنی لذیذ درگویش کودکان.

**قاقبۆ:** دەنگی خوێندنی کەو، دەنگی ژەرەژ[ف] صدای کبك.

**قاقبین:** خوێندنی کەو[ف] خواندن کبك.

**قاقـڕ:** ١) زەوینێ کە گیای لێ نارۆێ؛ ٢) برێتی لە بنیادەمی رژد[ف] ١) زمینی که گیاه نرویاند، لم یزرع؛ ٢) کنایه از خسیس.

**قاقرەش:** جۆرێ کوُلەکە[ف] نوعی کدو.

**قاقز:** قاغز[ف] کاغذ.

**قاقژ:** قاژوُ[ف] زاغ پاقرمز.

**قاقـل:** ١) تێکـوڵی هێلکە؛ ٢) بنی گیایەکە دەیخۆن[ف] ١) پوستهٔ تخم پرنده؛ ٢) بیخ گیاهی است خوردنی.

**قاقلۆك:** کەللەسەر، قاف، قەحف[ف] جمجمه.

**قاقلەجنۆکە:** شەیتانۆکەی وشك[ف] پوستهٔ حلزون.

**قاقلەسۆنە:** دۆشەکۆڵەی سەری عەنبالان[ف] بالشتك سر حمّال.

**قاقلەسوێنە:** قاقلەسۆنە[ف] بالشتك سر حمّال.

**قاقم:** جانەوەرێکە لە تیرەی سمۆرەو سنجاو دەگەڵ گیا رەنگ دەگۆڕێ[ف] قاقم.

**قاقمە:** داری هەردولاو داری پشتی تامان[ف] چوبهای عمودی دیوار چوبی.

**قاقوُلە:** بەری گیایەکە بۆ دەرمان دەبێ[ف] ثمر گیاهی است که مصرف طبی دارد، قاقله.

**قاقوم:** قاقم[ف] قاقم.

**قاقـە:** ١) براگەورە بە زمـانی منـاڵان؛ ٢) خواردنی شیرین بە شێوەی پچـوُکـان؛ ٣) سورێچکـە، قورقـوڕاگە: (دەستی دە بینە **قاقەی** نابو دەیخنکـانـد)[ف] ١) برادربـزرگ بە زبـان کودکانه؛ ٢) شیرینی در گویش بچگانه؛ ٣) بیخ گلو، سرخنای.

**قاقەز:** قاغز[ف] کاغذ.

**قاقەزێن:** کایە بە پەڕی پاسوُر کردن[ف] بازی با ورق.

**قاقی:** داڵگۆشت‌و لاوازی کورتەبالا[ف] لاغر کوتاه‌قد.

**قاقیشك:** قاژوُ[ف] زاغچه.

**قاقیلۆك:** تەختەساف، دەزوی لەسەر مقەبیا هەڵکراو[ف] گلوله نخ.

**قاقیله:** قاقی[ف] لاغر کوتاه‌قد.

**قاگەز:** قاغز[ف] کاغذ.

**قال:** ١) دەمەجاوێك بنێشت؛ ٢) چەقەچەق؛ ٣) باس، دوان؛ ٤) تێخوڵ‌و پرزەی دار؛ ٥) دەنگ‌وباسی ناو خەڵك[ف] ١) مقدار سقز به اندازهٔ یك بار جویدن؛ ٢) جنجـال، هیاهـو؛ ٣) بحث، گفتار؛ ٤) قشر و الیاف درخت؛ ٥) شایعه.

**قاڵ:** ١) تاواوە؛ ٢) لەکـاردەرهـاتگ، راهاتو لە کار؛ ٣) تەجرەبەدیتوُ لە ژیانـدا؛ ٤) چەقـەچەق؛ ٥) پوُش، چیلکە: (قرش‌و **قاڵ**)؛ ٦) باس، بەحس[ف] ١) گداخته، تفته؛ ٢) کارامد؛ ٣) تجربه‌دیده در زندگی؛ ٤) جنجال؛ ٥) خاشاك؛ ٦) بحث.

**قالا:** گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد[ف] ازروستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**قالاخ:** ١) دەوەی وشکـەوە بوُگ، تەپـاڵـە؛ ٢) قەلـەڕەشە[ف] ١) تاپالهٔ خشك؛ ٢) کلاغ سیاه.

**قالاخدان:** دەوەلان[ف] انبار تاپاله.

**قالاخی:** پارچەیەکی رەشە، مادام[ف] نوعی پارچهٔ مشکی.

**قالاخی‌پۆش:** رەشپۆش، برێتی لە تازیەدار[ف] مشکی‌پوش، کنایه از عزادار.

**قالاس:** گۆزەڵـە یان کوندەی پچوُك بۆ ئاو[ف] ظرف کوچك مخصوص نگهداری آب.

**قالاغ:** تەپاڵە، قالاخ[ف] تاپالهٔ خشك.

**قالاغدان:** قالاخدان[ف] انبار تاپاله.

**قالان:** شیربایی[ف] شیربها.

**قالاو:** قەلەڕەشە[ف] کلاغ سیاه.

**قالاوبازەڵە:** قشقەڕە، قەلەباچکە، قشقەڵە[ف] زاغچه.

**قالاوەبوُڵینە:** قەلەسابوُنی[ف] کلاغ خاکستری رنگ.

**قالایی:** کانزایەکی نەرمی سپیە مسی پێ سپی دەکەنەوە، قەلایی[ف] قلع، ارزیز.

**قالب:** ١) شتێ کە کانزای تاویاوی تێ‌دەرێژن؛ ٢) جەستە،لەش،بەدەن؛ ٣) ژمـارە بۆ دارژاوی تونـدەوەبوُگ: (قالبە سابوُن، قالبە بەفر)؛ ٤) قوتـــو، دەفـر بۆ شت تێدافـرۆشتن: (قـالبەشـەمچـە)[ف] ١) قالب ریخته‌گری؛ ٢) تن، بدن؛ ٣) واحد شمارش اشیاء در قالب ریخته؛ ٤) قوطی، جعبهٔ بسته‌بندی.

**قاڵب:** ١) قالب؛ ٢) زەوینێ کە بۆ چەڵتـوُك‌چاندن راست کراوە[ف] ١) نگا: قالب؛ ٢) زمین آماده برای شالی.

**قاڵبـوُن:** ١) توانـەوە لە سەر ئاگر؛ ٢) کارامەبوُن؛ ٣) تەجرەبەدیتن لە ژیاندا[ف] ١) ذوب شدن بر آتش؛ ٢) کارآمدشدن؛ ٣) تجربه‌دیدن در زندگی.

**قاڵتـــاخ:** ١) دارێ کە لە زین‌دا دەکـــارکـــراوە؛ ٢) برێتـی لە پیری لەکارکەفتگ[ف] ١) قلتاق، چوب داخل زین؛ ٢) کنایه از پیر فرتوت و از کار افتاده.

**قاڵتاغ:** قاڵتاخ[ف] نگا: قاڵتاخ.

**قاڵچغ:** داسوکەی گوڵی وشکی خەلە ف پر ز خوشهٔ غلّهٔ خشك.
**قاڵدرمە:** قادرمە ف نگا: قادرمە.
**قاڵس:** ۱) جارز، قارس؛ ۲) تووڕە ف ۱) پکر؛ ۲) خشمناك.
**قاڵشت:** ۱) تێکوڵی‌دار؛ ۲) تەلاشەدار، تەڕاش ف ۱) پوست درخت؛ ۲) تکهٔ شکسته از درخت.
**قالك:** ۱) قاشل؛ ۲) قوتو ی چکۆلە؛ ۳) قاپۆرەفیشەك؛ ۴) قالب ف ۱) پوسته؛ ۲) قوطی کوچك؛ ۳) پوکه؛ ۴) نگا: قالب.
**قاڵماسك:** بەرەقانی، قۆچەقانی، کەهنیك ف فلاخن.
**قاڵماسکە:** قالماسك ف فلاخن.
**قاڵمەقاڵ:** چەقەوهەرا ف جنجال و هیاهو.
**قاڵمەقاڵم:** قاڵمەقاڵ ف جنجال و هیاهو.
**قالنگ:** داری سەرخوار بۆ میوەچنین ف چوب سرخمیده دراز برای میوەچینی.
**قالنی:** عەرەبانەی لەدار ف ارابهٔ چوبی.
**قالو:** ناوی چەند دێیەکە ف نام چند روستا.
**قالـۆ:** بەرد یان خشتی لەسـەر ئاگر دانراو لەباتی سێڵ بۆ نان‌پێژان ف خشت یا سنگ برآتش به جای ساج.
**قالوچ:** جۆرێ داسی پچوك ف نوعی داس کوچك.
**قالــۆچـە:** جانـەوەریکـە چکـۆڵـەی ڕەش چەنـد جۆرە باڵیشی هەیە تیرەیەکیان ریخ گزمۆلە دەکاو پاڵی دەدا، کێزك ف سوسك.
**قالـۆر:** ۱) ساقـەتەگیای وشکی ئەستوری ناوبەتاڵ، قاقۆ؛ ۲) ئێسکی لولاك ف ۱) ساقه گیاه خشك کاوك؛ ۲) استخوان ساق.
**قالۆرە:** قالۆر، ساقەتەگیای ناوەرۆك‌خاڵی ف ساقهٔ گیاه کاوك.
**قالۆز:** دارۆکەیەکە لە تەڵەکەوریشکدا ف چوبکی در تلهٔ خرگوش.
**قالۆس:** ناوی هەوایەکی گۆرانیە ف نام آهنگی است.
**قالون:** سەبیلەی کلك‌درێژ ف چپق دستەدراز.
**قالۆنچە:** قالۆچە ف سوسك.
**قالـە:** ۱) بـاڕەی بزن؛ ۲) سوکـەڵەناوی قادر ف ۱) صدای بلندبز؛ ۲) مخفّف قادر.
**قاڵە:** چەقە، هەرا ف جنجال و هیاهو.
**قاڵەقاڵ:** چەقەو هەرای زۆر ف جنجال و غوغای زیاد.
**قاڵەقنگ:** باسکلاو، کلاوبن ف پیل گوشك، برگ ریواس.
**قالەك:** تاوپاوەی زێڕ و زیو ف گداختهٔ زر و سیم.
**قالەن:** ستور، ئەستور، قەبە، بەگرتك ف ستبر.
**قاڵی:** ۱) کارامەیی؛ ۲) مافورە ف ۱) مهارت؛ ۲) قالی، فرش.
**قالی‌جۆ:** دوگوندی کوردستان بەم ناوە بەعسی کاولی کردوە ف دو روستا به این اسم در کردستان توسط بعثیان ویران شده است.
**قالیچە:** مافوری پچوك ف قالیچە.
**قاڵیچە:** قالیچە ف قالیچە.
**قام:** ۱) گۆرانی؛ ۲) ئالی، لا؛ ۳) ئاکار؛ ۴) بڵندایی باڵای بنیادەم؛ ۵) دەرفـەت؛ ۶) وزە، هێزو توانـا؛ ۷) لەبیچم و تەحـرا وەك یەك ف ۱) ترانـه، آهنـگ؛ ۲) طرف؛ ۳) روش؛ ۴) بلنـدی قامت انسـان؛ ۵) فرصت؛ ۶) توان؛ ۷) شباهت.
**قامبێژ:** گۆرانی‌بێژ ف ترانەخوان.
**قامچ:** دەرفەتی وەدەست‌کەوتن ف فرصت دسترسی.
**قامچور:** سەرژمێری مالات بۆ ماڵیات ف سرشماری دام برای اخذ مالیات.
**قامچورچی:** پوشانەوەرگر بۆ دەوڵەت ف مالیات بگیر.
**قامچی:** ۱) تازیانە، شەلاخ؛ ۲) گۆرانی‌زان ف ۱) تازیانە؛ ۲) ماهر در ترانەخوانی.
**قامخــۆش:** ۱) کەسێ یان شتێ کە بە سانــایی دەس دەکـــەوێ؛ ۲) ڕەوشت‌باش و پەسنـد ف ۱) آسـان‌یاب، سهـل‌الوصول؛ ۲) دارای اخلاق نیکو.
**قامر:** ئەو نەیە زراڤە کە دەکرێتە قەڵەم ف نوعی نی باریك که از آن قلم سازند.
**قامك:** ۱) ئەنگوست، تبل، تلی؛ ۲) گەی تبل؛ ۳) چەنداری بە پەنجەرە دە چەرخی گاریدا ف ۱) انگشت؛ ۲) بند انگشت؛ ۳) پرەهای چرخ گاری.
**قامکرن:** پێوانی درێژایی‌و قوڵایی ف اندازەگیری طول و عمق.
**قامکەوانە:** ئەو چەرمەی کە قامکی تێ دەکەن بۆ دروێنە یان کاری‌تر ف انگشتانهٔ چرمی.
**قام‌نەخۆش:** ناپەسند، روگرژ، نەگونجاو ف ناباب در دوستی.
**قاموس:** فەرهەنگ، وشەدان ف لغتنامە.
**قاموش:** چیتك ف نَی.
**قاموقلافەت:** بەژن زراوی جوان‌چاك ف زیبای باریك اندام.
**قامیش:** ۱) چیتك؛ ۲) گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف ۱) نَی؛ ۲) نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.
**قامیشان:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.
**قامیش‌بەند:** چیغی لە قامیش ف چیغ ازنَی.
**قامیشلی:** ناوچەو شارێکە لە کوردستان ف منطقه وشهری در کردستان.
**قامیشە:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.
**قامیشەڵان:** شوێنێ کە زۆری قامیش لێ ڕواوە ف نیزار.
**قامیشەڵین:** قامیشەڵان ف نیزار.
**قامیشی‌پاشا:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.
**قان:** ۱) دەرفـەت بۆ دوبـارەبـازی کردن: (قانم بدە ئەم جارەش)؛ ۲) خوێن‌بایی؛ ۳) توری ناوپوك؛ ۴) خاڵی ڕو، نیشان ف ۱) مهلت بازی به بازنده؛ ۲) خونبها؛ ۳) ترب‌پوکیده؛ ۴) خال صورت.
**قاناو:** دێراوی باغ ف جوی آبیاری باغ.
**قانتر:** ئێستر، قاتر ف استر.
**قانتــەرە:** گونـدێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**قانج:** باش، بەدڵ ف خوب، پسند.

**قانجاز:** بەهرە، سوُد، قازانج ف سود.

**قانچە:** سوانە، سوانگە ف لبهٔ بام.

**قانح:** رازی ف قانع.

**قاندن:** کوڵین: (عەرزە کەی هەڵقاند) ف کندن.

**قاندەلیك:** دەفری رۆنوماستی بەردەستان ف ظرف وردست در آشپزخانه.

**قانزاج:** قازانج ف سود.

**قانع:** قانح ف قانع.

**قانك:** قەڵماسك، قۆچەکانی، بەرەقانی ف فلاخن.

**قانگ:** ۱) دوُکەڵ، دوُ؛ ۲) ئەسپەندەر؛ ۳) قان، دەرفەت بۆ دوبارە بازی کردن؛ ۴) تربی ناوپوُك؛ ۵) دەنگی خوێندنی دوزنا ف ۱) دود؛ ۲) گیاه اسپنـــد؛ ۳) مهلت به بازیگـر بازنـده؛ ۴) ترب پوکیده؛ ۵) صدای خواندن دُرنا.

**قانگدان:** ۱) بە دوُکەڵ دەرکردن؛ ۲) مۆڵەتی دوبارەدان بە بازی کەر ف ۱) با دود بیرون کردن؛ ۲) مهلت دوباره به بازیگر.

**قانگڵە:** کۆمەڵەبەنێ کە لە نێوان قامکی گەورەو تۆتەدا هەڵ دەکرێ ف کلاف نخ برهم پیچیده درمیان دو انگشت باز.

**قانگڵەسوێنە:** قاقلەسوێنە ف نگا: قاقلەسوێنە.

**قانگــە:** ۱) خەنـدەکی بنـاغـەی خانـو؛ ۲) سەبیلەی کلكدرێژ ف ۱) شالوده، اساس؛ ۲) چپق دستەدراز.

**قانگەلاش:** بنەکەنگری وشکی بابردە ف بته کنگرخشك بادبرده.

**قانگەلاشك:** قانگەلاش ف نگا: قانگەلاش.

**قانگەڵە:** قانگڵە ف نگا: قانگڵە.

**قانوُن:** ۱) رێو شوێنی ناو کۆمەڵ؛ ۲) ئامرازێکی موسیقا ف ۱) قانون؛ ۲) از آلات موسیقی.

**قانە:** ۱) دێراوەڕەز؛ ۲) توێ‌قوماش لە تۆپەقوماش‌دا؛ ۳) گەزی پێوان ف ۱) جوب تاکستان؛ ۲) لایەهای پارچە در توپ پارچە؛ ۳) زرع قماش پیمایی.

**قانەقدی:** ختوُکە ف غلغلك.

**قانەقدیکە:** ختوُکە ف غلغلك.

**قانەقدیلکە:** ختوُکە ف غلغلك.

**قانەمێو:** دێراوەڕەز ف جوب تاکستان.

**قانی:** پەڵە، لەککە ف لکە.

**قانیك:** شتێ کە ئەیجاون، چەققە، جاچك ف جویدنی. *مانند آدامس و غیره*.

**قاو:** ۱) پوُشوُی دار؛ ۲) دەنگی بەرز؛ ۳) ئیشـاعـە، خەبەرێ کە دەناو حەشـاماتدا بڵاو بۆتەوە؛ ۴) شەپ، شەق؛ ۵) دەفری شێوتێکردن، قاپ؛ ۶) پاژنەی تفەنگ، قۆنداخ؛ ۷) شەقاو ف ۱) پدە؛ ۲) صدای بلند؛ ۳) شایعە؛ ۴) تیپا؛ ۵) ظرف غذاخوری؛ ۶) پاشنهٔ تفنگ؛ ۷) گام.

**قاوت:** ئاردی دەخڵی برژاو ف قاووت.

**قاوتاندن:** دەرکردن بە گوڕەو هەراوە ف بیرون راندن با صدا و جنجال.

**قاوخ:** ۱) قاقل؛ ۲) قاپوڕ ف ۱) پوستهٔ تخم پرنده؛ ۲) پوکه.

**قاوداخستن:** ئیشاعەبڵاوکردنەوە ف شایعەپراکنی.

**قاوداکەوتن:** دەنگۆ،ئیشاعە بڵاوبوُنەوە ف شایعەپراکندەشدن.

**قاودان:** ۱) دەرکردن بە هەراهەرا؛ ۲) شەق تێ هەڵدان ف ۱) هَوکردن؛ ۲) تیپازدن.

**قاوڕ:** قاپوڕ ف پوکە.

**قاورمە:** گۆشتی سوُرەوەکراوی دەناودەفرخراوی هەڵگیراو ف قرمە.

**قاورمەسەوزی:** خۆرشتی گوشتو سەوزی ف قرمەسبزی.

**قاوش:** شوێنی نوستنی بەکۆمەڵ ف خوابگاه دستەجمعی.

**قاوشان:** ناوچەیەکە لە کوردستان ف ناحیەای در کردستان.

**قاوغ:** قاپوڕ ف پوکە.

**قاوکردن:** ۱) بانگ‌کردن؛ ۲) بە چەقەو هەرا وەدەرنان ف ۱) صدازدن؛ ۲) با سروصداراندن، هوکردن.

**قاوکوڵ:** جۆرێ تفەنگی پاژنەکورت ف نوعی تفنگ.

**قاولەمە:** ۱) قابڵەمە؛ ۲) برێتی لە خۆراکێ کە دەیبەن لە دەشت دەیخۆن ف ۱) قابلمە؛ ۲) کنایەاز غذای پیك نیك.

**قاون:** ۱) قاوخ؛ ۲) گندۆرە، کاڵەك، قارپوز ف ۱) پوکە؛ ۲) خربزە.

**قاوُوت:** تۆشەی رێبوار، تیشەی سەفەر ف توشهٔ راه.

**قاووقریشك:** زەنازەنا ف همهمە و جنجال.

**قاووقوُ:** قاووقریشك ف همهمە و جنجال.

**قاووقیژ:** قاووقریشك ف همهمە و جنجال.

**قاوە:** بەری دارێکە لە دەنکە جۆ درشت‌تر بە رەنگی زەیتوُنی بۆی دەدەنو دەیهـاڕنو لە ئاودا دەیکـوڵێنو دەیخـۆنـەوە دارەکـەی لە یەمـەنو حەبەشەو بەرازیل دەڕوێ ف قهوە.

**قاوەبرێژ:** دەفری قاوەتێدابرژاندن ف ظرف قهوەبودادن.

**قاوەتوُن:** ۱) تاشت؛ ۲) تاشتی ف ۱) چاشت؛ ۲) صبحانە.

**قاوەتی:** ۱) قاوەتوُن؛ ۲) فراوین ف ۱) صبحانە؛ ۲) ناهار.

**قاوەجاغ:** تفك، کوانو ف اجاق.

**قاوەجۆش:** دەللە، دەفری قاوەتێداکوڵاندن ف قهوەجوش.

**قاوەچی:** ۱) کەسێ کە پیشـــەی قاوەســازکــردنــە؛ ۲) چایچی ف ۱)قهوەچی؛ ۲) چای‌پز، چایچی.

**قاوەخـانە:** ۱) دوکانی قاوەی کوڵاو فرۆشتن؛ ۲) دوکانی چای لێندراو فرۆشتن ف ۱) قهوەخانە؛ ۲) چایخانە.

**قاوەسینی:** سینی پچوُك ف سینی کوچك.

**قاوەقاو:** زەنازەنا ف سروصدا، همهمە.

**قاوەلـتی:** ۱) نێوانی بەیانیو نیمـــەڕۆ؛ ۲) نانی بەیانی، تاشت ف ۱) چاشت‌هنگام؛ ۲) صبحانە.

**قاوەلتی‌کردن:** نانی بەیانی خواردن ف صبحانەخوردن.

**قاوەیی:** رەشی ئامالْسوُر ف رنگ قهوەای.

**قاویت:** قاوت ف قاووت.

**قاویچ:** جاوینەوەی پەڵخوڕ ف نشخوار.

**قاوێر:** کەمە، کەمەیی، کەللەبێژنگو هێلەك ف چنبر غربال و الك.

**قاویش:** ١) قاویچ؛ ٢) چەرمی دەباغدراوی ڕەنگ کراو ف ١) نشخوار؛ ٢) نوعی چرم.

**قاهیم:** پەیت، خۆگر، قایم ف محکم.

**قای:** وشەی پرسیار،ئەی چۆن؟، کەوابو؟، کەوایە؟ ف پس چطور؟

**قایخ:** بەلەم، لۆتکە ف قایق.

**قایخەوان:** بەلەمئاژۆ ف قایقران.

**قایغ:** قایخ ف قایق.

**قایغەوان:** قایخەوان ف قایقران.

**قایش:** ١) چەرمی ڕەنگ کراو؛ ٢) ئاڵقەچەرمێ کە هەوجاڕو نیرلێك دەبەستێ؛ ٣) کێشەو هەرای ناحەزانە ف ١) چرم ورنی زدە؛ ٢) رابط میان خیش و یوغ؛ ٣) دادوقال.

**قایل:** ڕازی ف راضی.

**قایل کردن:** ١) هێنانەڕەدایە؛ ٢) تاوکردن ف ١)راضی کردن؛ ٢) آمادە کردن برای ازدواج.

**قایل کرن:** قایل کردن ف نگا: قایل کردن.

**قایم:** ١) قاعیم، توند، پتەو؛ ٢) شاراوە: (ماڵەکەم لە شوێنێ قایم کرد) ف ١) محکم؛ ٢) پنهان شدە.

**قایمسنجە:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان کە توسط بعثیان ویران شد.

**قایمکار:** بەمشوور ف مدبّر.

**قایمکاری:** مشوورخواردن لە کەلوپەلو بژیو ف محکم کاری.

**قایم کردن:** ١) توندکردن، پتەوکردن؛ ٢) داخستن بۆ دەرك و پەنجەرەو قفڵ؛ ٣) شاردنەوە ف ١) سفت و محکم کردن؛ ٢) بستن در و قفل و...؛ ٣) پنهان کردن.

**قایمە:** ١) داربەستی دارەمێو؛ ٢) شێراوە بۆ ڕۆژی خۆی؛ ٣) نەدۆڕانو نەبردنەوە لە دامەدا؛ ٤) پتەوە، توندە ف ١) داربست تاك؛ ٢) نهفتە برای روز مبادا؛ ٣) نتیجۀ مساوی در بازی داما؛ ٤) محکم است.

**قایمە کاری:** قایمکاری ف محکم کاری.

**قایمی:** توندی، پتەوی ف استواری، سفتی.

**قاینجە:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان کە توسط بعثیان ویران شد.

**قایە:** پەناگا، ئەنوا ف پناهگاە.

**قایەخ:** بەلەم، لۆتکە ف قایق.

**قایەر:** سووکەناوی قادر ف مخفف نام قادر.

**قبڕاخ:** ناوبژی، ئەوی دوکەس لە سەر مەبەستێ پێكدێنێ ف میانجی.

**قبوڵ:** پێڕازی ف قبول.

**قبووڵی:** ١) شێوی برنجی نەپاڵێوراو، پلاوی بێپاڵافتن؛ ٢) بانگهێشتنی خەڵك ف ١) دمپخت؛ ٢) مهمانی.

**قبەقب:** دەنگی خوێندنی کەو، دەنگی بانگ کردنی ژەرەژ ف صدای خواندن کبك.

**قپ:** بێدەنگی، دەگەڵ قڕ دێژن: (قڕو قپ) ف خاموشی، بی صدایی.

**قت:** ١) فت، دەراویشتن لە ڕیز؛ ٢) کەموسکە، تۆزقاڵ، پیچەك ف ١) حذف؛ ٢) بسیار اندك.

**قتاو:** ١) پەڕاو، کتێب، کدێب؛ ٢) درزخوێنی فێرگە ف ١) کتاب؛ ٢) شاگرد مدرسە.

**قتاوخان:** ١) عەماری پەڕاوان؛ ٢) فێرگە ف ١) کتابخانە؛ ٢) آموزشگاە.

**قتاوخانە:** قتاوخان ف نگا: قتاوخان.

**قتاوی:** زارۆکی فێرگە ف شاگرد دبستان.

**قتك:** ١) کورکوڕ، قەتێ؛ ٢) جۆرێ خەیار ف ١) پرندۀ سنگخوارە؛ ٢) نوعی خیار.

**قتلاب:** کەڤۆت، کەوت، کەبوت، دارێکی لێرەواری سەختە ف نوعی چوب محکم.

**قتووت:** ١) داگیر؛ ٢) داگیرکردن ف ١) غصب؛ ٢) غصب کردن.

**قتوفت:** جرتو فرت ف جنب وجوش دائمی.

**قتی:** ترۆزی، چەمیلە ف خیار چمبر.

**قجی:** گیایەکە بۆ دەرمان دەشێ، پێمریشکە ف گیاهی است دارویی.

**قجیاوا:** ناوی گوندێکە لە لای مەهاباد ف نام روستایی است.

**قجیلك:** قامکەتووتە ف انگشت کوچك.

**قجیلە:** ١) قجی؛ ٢) جۆرێ کلۆ ف ١) نگا: قجی؛ ٢) نوعی ملخ.

**قچ:** ١) فرزەندی مێوینە، دۆت؛ ٢) ئەژنۆ؛ ٣) پووزو بەلەك؛ ٤) ددان گڕ، کەسێ کە لێوی کورتەو ددانی دیارە؛ ٥) لەسەرهەست ف ١) دختر؛ ٢) زانو؛ ٣) ساق پا؛ ٤) شخص دندان آشکار؛ ٥) حسّاس.

**قچقچاندن:** چۆقاندنی ڕۆن، هەڵکزاندنی دووگ ف گداختن روغن یا دُنبە برآتش.

**قچك:** بچووك، چکولووکە، بیچکەلانە، بوچکەلە ف کوچولو.

**قخ:** وشەیەکە بە منالی دەڵێن واتا: پیس ف کلمۀ تحذیر بچە بمعنی پلید، اخ.

**قخخە:** قخ ف نگا: قخ.

**قخە:** قخ ف نگا: قخ.

**قد:** دەنگی مریشك بۆ بانگ کردنی جوچکە ف صدای مرغ، قُدقُد.

**قدقد:** قدی لەسەر یەك ف قدقد مرغ.

**قدقدانك:** ختووکە ف غلغلك.

**قدۆش:** بەدۆدم، یێڕەش، شوم ف نحس، شوم.

**قدۆشی:** ئاکارو کردەی قدۆش ف شومی، بدقدمی.

**قدوم:** هێزی ئەژنۆ: (لەترسا قدومم لێ شکا) ف نای راە رفتن، قدرت حرکت.

**قدیك:** دڵتەنگ، خەمبار ف دلتنگ.

**قدیکە:** ختووکە ف غلغلك.

**قدیلکانێ:** ختووکە ف غلغلك.

**قدیلکە:** ختووکە ف غلغلك.

**قدیلە:** ختووکە ف غلغلك.

**قڕ:** ١) ئاسەواربڕانەوە، مردنی هەموانی؛ ٢) خویس، خووس؛ ٣) سەرما؛ ٤) بێدەنگی: (قڕو قپ)؛ ٥) دەنگی زلی باڵدار: (نەقڕ نەفڕ)؛ ٦) ناز،

دەگەڵ نیمقڕ دەگوترێ: (قڕو نیمقڕ دەکا) ف ۱) مرگ همه‌گیر؛ ۲) پژ، سرماریزه؛ ۳) سرما؛ ۴) خاموش؛ ۵) صدای بم پرنده؛ ۶) تاز.

**قراج:** قاقڕ، زەوی ڕووتەن ف زمین لخت از گیاه، لم یزرع.

**قراخ:** قەراغ، کەنار ف کنار.

**قراڕك:** قالاو ف کلاغ.

**قڕاش:** ۱) قاش لە میوە؛ ۲) لەت، پارچە ف ۱) قاچ، برش از میوه؛ ۲) پاره.

**قڕاشقڕاش:** لەت‌لەت، پارچەپارچە ف پاره‌پاره.

**قڕاف:** خوسار، سیخوار ف سرماریزه، پژ.

**قڕاقڕ:** زەنازەنا ف سر وصدا.

**قڕاك:** قالاو، قالاخ ف غراب، کلاغ.

**قڕاکە:** کاسەلەشینکە، مەلێکی کەسکە ف پرندهٔ سبزقبا.

**قڕاڵ:** پاتشا ف پادشاه.

**قڕاڵی:** گونـدێکی کوردستـانـە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**قڕاڵی:** گوێزی گنخـاوی تێکوڵ‌ترینجاو بەدارەوە ف گردوی فاسدشدهٔ خشکیده بر درخت.

**قرام:** گیایەکە پرزەی دەهۆننەوە ف گیاهی الیافی.

**قڕان:** ۱) قڕکردن، مردنی بەکۆمەڵ؛ ۲) دەنگی قالاو؛ ۳) پارەیەکی ئێران بەرانبەری بیست‌شایی ف ۱) مرگ ومیر؛ ۲) آواز کلاغ؛ ۳) واحدپول، قران.

**قڕانـدن:** ۱) خوێنـدنی قالاو؛ ۲) بریتی لە نوخشانەی‌خراپ‌لێدان؛ ۳) ئاوکردنە سەهۆڵ ف ۱) قارقارکردن کلاغ؛ ۲) فال بد زدن؛ ۳) منجمدکردن.

**قڕانگە:** جێگەی بقە، شوێنی خەتەر ف مهلکه.

**قڕانن:** قڕاندن ف نگا: قڕاندن.

**قڕباق:** بۆق، بەق ف قورباغه.

**قڕبۆز:** سەروڕیش تێکەڵاو لە موی سپیو ڕەش ف مو جوگندمی.

**قڕبۆق:** قڕباق، بۆق، بەق ف قورباغه.

**قڕبـوون:** ۱) تێکڕامردن؛ ۲) خنکان‌بەبۆی گەن یان دوکەڵ ف ۱) مرگ همگانی؛ ۲) خفگی از بوی بد یا دود.

**قربیجه:** گیایەکی دەشتییە ف گیاهی است صحرایی.

**قرپ:** ۱) دەنگێ کە لە تێری لە گەروو دێ؛ ۲) تالان؛ ۳) لە ناوچوون؛ ۴) بڕین بە یەك‌تەورلێدان؛ ۵) پەرتاوتن؛ ۶) دەسکەنە؛ ۷) بڕەدارێك؛ ۸) پڕپێداکـردن: (قـرپانـدیو چو) ف ۱) آروغ؛ ۲) تاراج؛ ۳) از بین رفتن؛ ۴) قطع با یك ضربـه؛ ۵) هرس؛ ۶) درویادست؛ ۷) دسته‌ای هیزم؛ ۸) قاپیدن.

**قرپاڵ:** جلکی ڕزیوی هەلاهەلاپوی خێرپێوەنەماگ، قەرپاڵ ف لباس مندرس.

**قرپاندن:** ۱) پەرتاوتن، داپاچین؛ ۲) پڕپێداکردن ف ۱) هرس کردن؛ ۲) قاپیدن.

**قرپك:** قرپۆك ف نگا: قرپۆك.

**قرپنه:** چکۆڵەی خڕەکە، خڕپن ف کوچولوی چاق، تپل.

**قرپۆ:** خوێڕیو بێکارە ف بیکارهٔ ولگرد.

**قرپۆك:** ۱) قرپۆ؛ ۲) وشك‌هەڵاتوی مێوژ؛ ۳) بێ‌نرخ، ئەیاغ ف ۱) نگا: قرپۆ؛ ۲) مویز خشکیده؛ ۳) بنجل.

**قڕپۆك:** ۱) قڕباق؛ ۲) قرپۆك ف ۱) قورباغه؛ ۲) نگا: قرپۆك.

**قرپوڵ:** ۱) ئەیاغ؛ ۲) مێوژی وشك‌هەڵاتو ف ۱) بنجل؛ ۲) مویز خشکیده.

**قرپە:** ۱) دەنگ لەگەروهاتن‌لە تێری، قورقێنە؛ ۲) دەنگی شکانی ئێزنگ ف ۱) آروغ؛ ۲) صدای شکستن هیزم.

**قرپین:** دەنگی شکانی ئێزنگ، قرپە ف صدای شکستن هیزم.

**قڕپێ‌وەربوون:** قڕبوون ف به مرگ عمومی مبتلا شدن.

**قرت:** ۱)ئاخرپاژ لە شتێ: (هەموی خوارد قرتی لێ برێ)؛ ۲) بنیادەمی جلفو بلح؛ ۳) دەنگی مریشـك، قد؛ ۳) دەنگی بەددان لەت‌کردن: (بەنەکەم قرتاند، تۆم قرتاند) ف ۱) قسمت آخر، آخرین موجودی؛ ۲) هرزه، قرتی؛ ۳) صدای مرغ، قد؛ ۴) صدای شکستن و گسستن با دندان.

**قرتاڵ:** تریان ف سبد میوه‌چینی.

**قرتاڵە:** قرتاڵ ف سبد میوه‌چینی.

**قرتان:** ۱) پسان بە ددانو تۆرتۆ؛ ۲) تروکان بە ددان ف ۱) گسسته‌شدن با دندان و قیچی؛ ۲) شکسته‌شدن تخمه با دندان.

**قرتاندن:** ۱) بە ددان یا تۆرتۆ لەت‌کردن؛ ۲) ترۆکاندن ف ۱) با دندان یا قیچی قطع کردن؛ ۲) شکستن تخمه با دندان.

**قرتانن:** قرتاندن ف نگا: قرتاندن.

**قرتك:** ۱) دڵ‌تێکەڵ‌هاتن؛ ۲) بۆنی ناخۆشی گران؛ ۳) دوامین‌پاژ ف ۱) دل بهم آمدن؛ ۲) بوی تند گند؛ ۳) آخرین جزء از خوراك و...

**قرت‌کردن:** خشت‌کردن، ڕێك‌بڕین: (پەرچۆکەی بە قەیچی قرت کرد) ف صاف و راست بریدن.

**قرتکە:** قرت، دوامین پاژ ف آخرین جزء.

**قرتم:** ۱) بێقلی‌فیل؛ ۲) داسی درێژ، مەلەغان ف ۱) خرطوم؛ ۲) داس بلند.

**قرتمـاخە:** ۱) توێژ؛ ۲) پترۆك ف ۱) پردهٔ نازك روی شیر و ماست؛ ۲) خشك ریشهٔ زخم.

**قرتماغە:** قرتماخە ف نگا: قرتماخه.

**قرتن:** بریتی لە رژد، چرۆك، چنۆك، چکۆس، ڕەزیل ف کنایه از خسیس.

**قرتـە:** ۱) دەنگی مریشکی کورك؛ ۲) نیرەو مێوە لە جیاتی بشکۆژ؛ ۳) پچۆکترین‌پاژ ف ۱) صدای مرغ کرچ؛ ۲) منگنه؛ ۳) کمترین جزء.

**قرتەقرت:** دەنگی مریشکی کورك، قرتەی زۆر ف صدای پیاپی مرغ کرچ.

**قرتی:** قرت، جلف، بلح ف آدم هرزه، قرتی.

**قڕتیان:** ۱) بەددان‌پسان، قرتان؛ ۲) پسان ف ۱) با دندان گسسته‌شدن؛ ۲) پاره شدن، بریده شدن.

**قڕتێکەوتن:** قڕپێ‌وەربوون ف به‌مرگ عمومی مبتلاشدن.

**قرتیل:** کای درشتی بەرماوی حەیوان ف کاه درشت پس‌ماندهٔ حیوان.

**قرتین:** قرتان ف نگا: قرتان.

**قرتێن:** جانەوەرێ کە بە ددان شت دە قرتێنێ: (مشك بەن **قرتێنە**) ف هر جانوری که از تیرهٔ جوندگان است.

**قرتێنکە:** ۱) نێرەو مێوە لەباتی دوگمە؛ ۲) جێگەی بڕین لە سەربڕینی مەلدا ف ۱) منگنه؛ ۲) جای بریدن در گلوی پرنده.

**قرتێنـە:** ۱) نێرەو مێوە لەباتی دوگمە؛ ۲) شتێ کە نوکی قەڵەم قامیشی لەسەر دەقرتێنن ف ۱) منگنه؛ ۲) جسم سختی که برای قطعه‌زدن قلم نی استفاده میشود.

**قرچ:** ۱) دەنگی توانـەوەی رۆن لەسـەر ئاگر؛ ۲) توانەوەی رۆن لەسەر ئاگر؛ ۳) جرچ‌و ترنجاو لە سوُتانەوە؛ ۴) وشەیەکە لە بازی کەلاپێن‌دا؛ ۵) گەرمای زۆر؛ ۶) دەنگی سوُتانی چیلکەو ئێزنگ ف ۱) صدای داغ کردن روغـــن؛ ۲) داغ شدن روغـــن بر آتش؛ ۳) چروك شدن از سوختگی؛ ۴) اصـطلاحی درتیله‌بازی؛ ۵) گرمای شدید؛ ۶) صدای سوختن هیزم.

**قرچان:** توانەوەی رۆن لەسەر ئاگر ف گداختن روغن بر آتش.

**قرچاندن:** ۱) تواندنەوەی رۆن لەسەر ئاگر: ۲) چرچ‌ولۆچ کردن ف ۱) داغ کردن روغن؛ ۲) چروك کردن.

**قرچانن:** قرچاندن ف نگا: قرچاندن.

**قرچـاننـەوە:** برژاندنەوە، دەرمان‌کردن بۆ خوێن‌وەستان ف دواگذاشتن برای قطع خونریزی.

**قرچانەوە:** برژانەوە، ژانی جێ‌برین ف سوزش و درد زخم.

**قرچـاو:** ۱) رۆنی داغ‌کراو؛ ۲) چرچ‌هەڵگـەڕاو لە سوتـان ف ۱) روغن گداخته؛ ۲) چین و چروك خورده از سوختگی.

**قرچ‌قرچ:** سیڕە سیڕ لە ددانەوەهاتن ف صدای به هم ساییده شدن دندانها.

**قرچك:** قۆڵەکراس، ئانگوچك ف آستین.

**قرچ‌وبرێژ:** دەنگی برژانی گۆشت ف صدای بریان شدن گوشت.

**قرچۆك:** ۱) رژد، رەزیل؛ ۲) داوێ کە زوُ دەپسێ، پسۆك ف ۱) خسیس؛ ۲) نخ زودگسل.

**قرچۆڵ:** قرچاو، چرچ‌و ترینجاو لە سوُتان ف چین و چروك شده از سوختگی.

**قرچۆڵە:** قرچۆڵ ف نگا: قرچۆڵ.

**قرچوهۆڕ:** دەنگی سـوُتانی چەوری لەسەر ئاگر ف سر وصدای چربی بر آتش.

**قرچـە:** ۱) دەنگی رۆنی سەر ئاگر؛ ۲) دەنگی خوێ‌سوُتـان؛ ۳) دەنگی پشکـوتن‌و تەقینی برێشکـە لەسـەر ساج؛ ۴) دەنگی شکـانی دارو ئێسك؛ ۵) تەقەی پشت‌و قامك لە کێشان‌و کشاندا: (**قرچە** لە پشتمەوە هات، قامکم کێشـا **قرچـەی** هات)؛ ۶) تەوژمی گەرما: (بەم **قرچەی** هاوینــە)؛ ۷) دەنگی دەمی داس لە دروێنـەی خەڵـەدا؛ ۸) کڵۆش، لاسکی خەڵە ف ۱) صدای روغن گداخته؛ ۲) صدای سوختن نمك؛ ۳) صدای بریان شدن غلّات؛ ۴) صدای شکستن چوب و استخوان؛ ۵) صدای کشش ستون فقرات، و بند انگشتان؛ ۶) شدّت گرما؛ ۷) صدای داس در حین درو؛ ۸) ساقهٔ غلّه.

**قرچـەشکێن:** تازە بەرپێ‌خستنی کڵۆش کە دەشکێ‌و نەکوتـراوە ف نیمکوب ساقه‌های غلّه در خرمن کوبی.

**قرچەقرچ:** قرچەی زۆر ف «قرچهٔ» بسیار.

**قرچەلۆك:** ژنی لاوازو رەقەڵە ف زنِ لاغر مردنی.

**قرچ‌هەڵاتن:** چرچ‌ولۆچ‌بوُنی پێست لەسوُتانەوە ف چین و چروك شدن پوست از سوختگی.

**قرچیان:** ۱) قرچ‌هەڵاتن؛ ۲) داغ‌بوُنی رۆن لەسەر ئاگر ف ۱) نگا: قرچ هەڵاتن؛ ۲) گداختن روغن بر آتش.

**قرچینۆك:** یەکەم بەری هەنجیر کە دەوەرێ ف اوّلین محصول انجیر.

**قرخ:** ۱) داڵگۆشت، لەڕ، لەجەر؛ ۲) ئاوی گەنیوی راوەستاو؛ ۳) دەفری سواڵــەتی کۆنی سواو؛ ۴) خوری‌و موُی کورت کە درێژ نابێت؛ ۵) موُی قرتاو؛ ۶) دەنگی گەروُ لە نەخۆشینەوە ف ۱) لاغر؛ ۲) آب راکد گنـدیده؛ ۳) سفـال کهنـه و ساییده؛ ۴) موی و پشم کوتاه که رشد نمی‌کند؛ ۵) موی کوتاه شده؛ ۶) صدای خرخر گلو در اثر بیماری.

**قرخاندن:** ۱) تاشینی موُی سەر؛ ۲) هەڵپەرتاوتن ف ۱) تراشیدن موی سر؛ ۲) هرس کردن درخت.

**قرخ کردن:** ۱) تاشینی موُ لەبن‌ڕا؛ ۲) هەڵپەرتاوتنی دار ف ۱) زدن مو از بیخ؛ ۲) هرس کردن درخت.

**قرخن:** ۱) کەسێ کە لە پیری یان نەخـــۆشی خڕە لە گەروُی دێت؛ ۲) لاواز؛ ۳) خوری‌و موُی خراپ کە بۆ رستن ناشێ ف ۱) کسی که در اثر پیری یا بیماری خرخرکند؛ ۲) لاغرمردنی؛ ۳) پشم نامرغوب.

**قرخنە:** قرخن ف نگا: قرخن.

**قرخۆ:** نێری قرخن ف پیرمردی که گلویش خرخر کند.

**قرخۆڵ:** داڵگۆشتی سیس‌و پیس ف لاغر پژمرده.

**قرخۆڵە:** قرخۆڵی چکۆڵە ف لاغر پژولیدهٔ کوچك.

**قرخە:** خڕخڕی گەروُ لە نەخۆشی‌و پیری ف خرخر گلو از پیری و بیماری.

**قرخەقرخ:** قرخەی زۆر: (پیرە هەر **قرخەقرخیە**تی) ف خرخر پیاپی.

**قرخەمەرەزێ:** ۱) خۆگرتن‌و نەسازان؛ ۲) قرخەمەرەسێ؛ ۳) کەم‌توُك ف ۱) ناهماهنگی و مخالفت؛ ۲) نگا: قرخەمەرەسێ؛ ۳) کم مو.

**قرخـەمـەرەسێ:** خۆ لەزەوی تونـدکـردن کە نەتوانن راستی کەنەوە، جۆرێ کایە ف نوعی بازی که در آن خود را به زمین می‌چسبانند که کسی نتواند بلند کند.

**قرخێنە:** قرقێنە، قورقێنە، قرپ ف آروغ.

**قرد:** ئەستێور ف سترون، نازا.

**قڕدان:** قنگ‌بادان ف قردادن.

**قردك:** کۆسە، کەسێ کە بۆ گاڵتەو نومایش شکڵی‌خۆی دەگۆڕێ ف دلقك.

**قردێلە:** پارچەی باریك بۆ سەروپرچ‌بەستن ف روبان گیسو بند.

**قڕڕە:** قڕە ف نگا: قڕە.

**قرژ:** ١) پەنجەی لێك‌بلاوی سەرچەمیاو: (چنگی **قرژ** کردبو)؛ ٢) کولێنی لەزەبر: (ئاوەکە **قرژ قرژ** دەکولێ)؛ ٣) لێك‌هالانی مو ف ١) انگشتان چنگك مانند؛ ٢) جوشیدن شدید، غلیان؛ ٣) درهم پیچیدگی مو.

**قرژاڵ:** ١) قارژنگ؛ ٢) برجێکە لە عاسمان ف ١) خرچنگ؛ ٢) برج سرطان.

**قرژاڵبـڕ:** گونـدێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**قرژاڵە:** ١) نەخۆشی شێرپەنجە؛ ٢) قرژە، جۆرێ بەری دارمازو ف ١) بیماری سرطان؛ ٢) نوعی ثمر مازوج.

**قرژانك:** ژالە، لوڕك ف خرزهره.

**قرژانگ:** قرژاڵ، قارژنگ ف خرچنگ.

**قرژە:** ١) نەخۆشی شێرپەنجە، قرژاڵە؛ ٢) جۆرێ بەری دارمازو ف ١) بیماری سرطان؛ ٢) نوعی ثمر مازوج.

**قرس:** خەمڵ، بەراورد ف براورد.

**قرســـان:** ١) بەراوردکــردن، خەمـڵانـدن؛ ٢) بەزۆر تێ‌ئاخنین ف ١) براوردکردن؛ ٢) بافشار انباشتن.

**قرساندن:** قرسان ف نگا: قرسان.

**قرساو:** ١) خەملاو، بەراوردکراو؛ ٢) تێ‌ئاخندراو ف ١) ارزیابی شده؛ ٢) انباشته با فشار.

**قرسیل:** ١) لاسکـەدەخڵی سەوز؛ ٢) سەمـەل، بەرمـاوی لەوەڕ ف ١) ساقه‌های سبز غلّه؛ ٢) پس‌ماندهٔ چرای دام.

**قرش:** چڵەکا، گیای بابردەڵە؛ ٢) پوڵەکەماسی؛ ٣) لکی شکاوی وشك ف ١) پرکاه؛ ٢) فلس ماهی؛ ٣) شاخهٔ خشك شکسته.

**قرشك:** چیلکەو چاڵ، پڕوپوش ف خس و خاشاك.

**قرشماڵ:** بێ‌حەیا، بێ‌شەرم ف بی‌شرم، دشنام زنانه.

**قرش‌وقاڵ:** پڕوپوش ف خس و خاشاك.

**قرشە:** کلۆشی سەرخۆیان ف ساقه‌های غلّه بر خرمن.

**قرشی:** بەڵمی هەرزن‌و چەڵتوك ف کاه ارزن و شالی.

**قڕقڕاچکە:** سورێنچکە ف خرخره.

**قڕقڕاگە:** سورێنچکە ف خرخره.

**قڕقـڕتـوك:** ١) سورێنچکـە؛ ٢) ئێسکی ناسك کە دای‌دەکرۆژن ف ١) خرخره؛ ٢) کرکرك، غضروف.

**قڕقڕۆچکە:** ستۆکورك، سورێنچکە، قڕقڕاگە ف خرخره.

**قرقرویچك:** زەنگەلۆر، کڕکڕاکە، کرۆچەنە ف غضروف، کرکرك.

**قڕقڕە:** غەڕغەڕەی دەزو لێ‌پێچان ف قرقره.

**قرقلتوك:** زەنگەلۆر ف غضروف، کرکرك.

**قڕقینە:** قرپ، دەنگی گەرو لە تێری ف آروغ.

**قڕك:** ١) قالاو؛ ٢) خڕایی گەردن، گوێزەی ئەستو ف ١) کلاغ؛ ٢) سیب آدمی.

**قڕکردن:** لەبەین‌بردنی بەکۆمەڵ ف میراندن دسته‌جمعی، نابودکردن همگانی.

**قرکێش:** نەخۆشیەکە لە گەرو دێت ف از بیماریهای گلو.

**قڕگ:** گەرو، ستۆ لەناوەوە ف گلو.

**قرگە:** ١) بەرێکی‌دارمازو؛ ٢) گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد ف ١) نوعی ثمـر مازوج؛ ٢) از روستـاهـای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**قرم:** ١) تێ‌ڕاخـوڕین؛ ٢) ئیشتیا، ئارەزو: (قـرمی لێ خۆش کردوە)؛ ٣) تەقەی بەرکی چەك ف ١) نهیب؛ ٢) هوس، آرزو؛ ٣) صدای گلوله.

**قرماندن:** ١) تێ‌ڕاخوڕین؛ ٢) تەقە لە چەکەوە هاتن ف ١) نهیب‌زدن؛ ٢) صدای گلوله.

**قرمچ:** ١) قرچانی پێست، چرچ‌هەڵگەڕان؛ ٢) لە ناو دەستا چرچ‌بون ف ١) چین‌خوردگی پوست، چروك؛ ٢) مچاله.

**قرمچی:** ١) قرچاو، هەڵقرچاو؛ ٢) لە ناو دەستا چرچ‌و ژاکاوبوگ ف ١) چین خورده، چروکیده؛ ٢) مچاله‌شده.

**قرمچین:** ١) ترنجـانی پێست؛ ٢) لە ناو دەستا چرچ‌و لۆچ‌بون ف ١) چروکیدن پوست؛ ٢) مچاله‌شدن.

**قرمز:** رەنگی سوری ئاچخ ف قرمز.

**قرمزی:** ١) قرمز؛ ٢) سوری ف ١) قرمز؛ ٢) سرخی.

**قرمژن:** دەنگی تەقەی زل: (تۆپ **قرمژنی** کرد، دارەکە شکا **قرمژنی** کرد) ف غرنبه، صدای مهیب.

**قرمە:** ١) دەنگی بەرکی چەك؛ ٢) دەنگی شکانی کۆتەرەدار؛ ٣) جۆرێ تفــەنگی ڕاو؛ ۴) جۆرێ درومـان ف ١) صدای گلولـه؛ ٢) صدای شکستن تنهٔ درخت؛ ٣) نوعی تفنگ؛ ۴) نوعی دوخت.

**قرمەقرم:** دەنگی تفەنگ‌هاویشتنی زۆر ف صدای رگبار گلوله.

**قڕنابیت:** گوڵی کەلەم ف گل کلم.

**قرنـاقــەو:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**قرنــج:** ١) شکـاوی زۆر کەم، شکانی پوك‌وپێست؛ ٢) درز بردنی کەم: (بـەردم پێدا کەوت سەرم **قرنجـاوە**، شوشـەکـەمان **قرنجاوە**) ف ١) خراش سطحی؛ ٢) درزکم.

**قرنجـان:** ١) شکانی پوك‌وپێست؛ ٢) درزبردن ف ١) خراش سطحی برداشتن؛ ٢) درز برداشتن.

**قرنجـانـدن:** ١) شکـانـدنی پوك‌وپێست؛ ٢) درزپێ‌بردنی کەم ف ١) خراشیدن سطحی؛ ٢) شکافتن جزئی.

**قرنجانن:** قرنجاندن ف نگا: قرنجاندن.

**قرنجیان:** قرنجان ف نگا: قرنجان.

**قرنگ:** لەنگین، ڕۆیشتنی شەلانە ف لنگیدن.

**قرنگە:** دەنگی وێك‌کەوتنی کانزا ف صدای بهم خوردن فلزّات.

**قڕنـو:** جانـەوەرێکی پانکـەڵـەی سورە بە ئاژەڵـەوە دەنـوسێ ف قراد، حشره‌ای کنه‌مانند.

**قڕنە:** قڕنو ف نگا: قڕنو.

**قڕنە گۆمە:** کایەو یەکترقوم‌کردن لە کاتی مەلەدا ف سر همدیگر را درآب فروکردن هنگام شنا.

**قڕنی:** قڕنە، قڕنو ف نگا: قڕنو.

**قرنیچك:** تەپۆ، پێشكەی دندۆكدرێژ ف نوعی پشهٔ درشت.

**قرنیس:** ۱) چیرێ، نەگونجاو، سەرسەخت لە قسەی خۆیدا؛ ۲) بریتی لە رژد، چنۆك ف ۱) لجوج؛ ۲) کنایه از خسیس.

**قرواق:** قرباق، بۆق، بەق ف قورباغه.

**قروپ:** شەپلە، ئیفلیجی ف بیماری فلج.

**قروت:** قرۆپ ف بیماری فلج.

**قروچیرەك:** هەراهەرا، شەرەقسە ف مجادله.

**قروش:** ۱) وردە پوڵ؛ ۲) پوڵێکی ترکان ف ۱) پول خرد؛ ۲) واحد پول ترکی.

**قرۆش:** جینگن، نوشو نالەبار ف نگا: جینگن.

**قروشکه:** پیاڵەی دەسکداری رۆکێش ف پیالهٔ لعابی دستەدار.

**قروقپ:** تەواو بێ‌دەنگ ف بی‌صدا، خاموش.

**قروقه:** بلاوەکردنی سواران بە پرتاو ف پراکنده شدن سواران با تاخت.

**قروقەپ:** قروقپ ف بی‌صدا.

**قروقەپۆز:** دەمو فلچ، لچو لێو ف لب و لوچه.

**قرونێ:** کتێبی عاسمانی بۆ ئیسلامان، قورحان، قورعان ف قرآن.

**قرونیمقرێ:** ۱) نازو نوز؛ ۲) ناوی پارچەیەکە ف ۱) نازوعشوه؛ ۲) نام پارچه‌ای.

**قرە:** ۱) چەقــە، زەنــازەنــا؛ ۲) دەنــگــی بۆق؛ ۳) دەنگی قالاو؛ ۴) دوامین کەس لە بازیدا: (بەشی قرە نان و گۆشتە)؛ ۵) دەنگی ناوزك ف ۱) سر وصـدا؛ ۲) صدای قورباغه؛ ۳) صدای کلاغ؛ ۴) آخرین نفر در بازی؛ ۵) قرقر شکم.

**قرهە:** ناحەز، ناشیرین، دزێو ف بدشکل.

**قرهاتن:** ۱) بەتەواوی مردنی هەمـوان؛ ۲) نازونـوزکردن ف ۱) انقراض، مرگ عمومی؛ ۲) نازکردن، عشوه‌آمدن.

**قرە گومە:** قرنەگومە ف نگا: قرنەگومە.

**قری:** قرپ ف آروغ.

**قریان:** هەدادان، نوقرەگرتن، هێدی‌بوون ف آرام گرفتن.

**قریپ:** هەراو هاوار ف غریو.

**قریپك:** سێ‌شەشی بەهار ف هیجده‌روز اوّل بهار.

**قریژ:** ۱) چلك‌وپیسی، گەمار؛ ۲) چلکن؛ ۳) کرێژی سەر ف ۱) کثافت؛ ۲) کثیف؛ ۳) شورهٔ سر.

**قریژاهی:** چلك‌و پیسی ف کثافت.

**قریژوك:** کون‌و دیوی ژورەوەی گوێ ف گوش میانی.

**قریژەبـەرد:** وردە شینـایی پێکـەوەچـەسپـاو کە بەسـەر بەردی‌دەشتەوە دەبینرێ ف گل سنگ.

**قریسك:** ئاورینگ ف شراره.

**قریشکه:** زیرە ف جیغ.

**قرین:** خوێندنی بۆق‌و قالاو ف صدای قورباغه و کلاغ.

**قرێن:** چەقەکردن پێکەوە ف جدال و هیاهو.

**قریو:** قریپ ف غریو.

**قریواندن:** هەراو هاوارکردن ف غریو سردادن.

**قریوانن:** قریواندن ف غریو سردادن.

**قریوه:** هەراو هوریا لەخـۆشیان: (رۆژێ بـەکۆچـەیەکـدا دەرۆیی پاتـشـایەك/لــە هەر کۆلان‌و بانێك بۆ بە هەراو قریوه) «پـروین اعتصامی» ف هورا و هلهله.

**قریوەقریو:** قریوەی زۆر ف هلهلهٔ بسیار.

**قز:** ۱) دوت؛ ۲) گۆی بازی ف ۱) دختر؛ ۲) گوی چوگان بازی.

**قزبان:** قەزوان، کەسکان ف چاتلانقوش.

**قزبـلاخی‌ژێرو:** گونـدێکـە لە کوردستـان بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**قزبلاخی‌سەرو:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستا که بعثیان آن را ویران کردند.

**قزرەبـات:** شاروکەی جێگەی بەخش هەموو بەحوکمی بەعسی دێهاتی دەورو بـەری دەرکـراو عەرەبی لێ نیشتـەجێ کرا ف شهری بخش مانند که به حکم بعثیها تمام دهات اطرافش تخلیه و تعریب شد.

**قززلقورت:** ۱) جوێنێکە؛ ۲) کرمی گیابڕ ف ۱) دشنامی است، کوفت؛ ۲) کرمی است سمّی برای دام.

**قزگە:** ئەو شوێنەی لەوێ بە گۆچان لە گۆ دەدەن ف جایی که از آن گوی را ضربه می‌زنند.

**قزل:** پەزی دەموچاوسور ف گوسفند رخساره سرخ.

**قزلان:** تیرەیەکە لە یەزیدیەکان لە کوردستان ف تیره‌ای از یزیدیان در کردستان.

**قزلبـاش:** ۱) چەکـداری لەشکـری سەفـەویانی ئێران؛ ۲) زوربـەی کوردانی دەرسیم لە کوردستانی بەردەستی ترکان ف ۱) قزلباش؛ ۲) اکثریت اکراد ساکن درسیم در کردستان ترکیه.

**قزلجـه:** گونـدێکی کوردستـانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**قزلجه:** ناوی گوندێکە لە لای مەهاباد ف نام روستایی است.

**قزلجی:** مامـۆستـایەکی ئاینی زانـاو بەنـاوبانگی کورد بوە ف یکی از علمای دینی مشهور کرد.

**قزلقوبی:** ناوی گوندێکە لە لای مەهاباد ف نام روستایی است.

**قزلقورت:** قززلقورت ف نگا: قززلقورت.

**قزل‌وەزان:** قزل‌وەزەن ف رود قزل اوزون.

**قزل‌وەزەن:** چۆمێکە لە کوردستان ف رود قزل اوزون.

**قزلـەر:** گونـدێکی کوردستـانـە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**قزلیار:** گونـدێکی کوردستـانـە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**قزه:** ترسەنۆك ف بزدل.

**قزەلقورت:** قززلقورت ف نگا: قززلقورت.

**قژ:** ۱) تۆکـەسـەری درێژ؛ ۲) توێژی سەرشـتی ترشـاو؛ ۳) دەنگی بەچکەمەل کە دایکی دێتەوە لای؛ ۴) دەنگی چێشکە لە کاتی ترسدا ف ۱) موی بلند سر؛ ۲) کف ترشیده؛ ۳) صدای جوجه‌پرنده که مادر

را می‌بیند؛ ۴) صدای گنجشك در موقع ترس.

**قڕاك:** ۱) قاڕو؛ ۲) قالاو ف ۱) زَغن؛ ۲) کلاغ.

**قڕاكه:** تاق‌تاقكەره ف مرغ حق.

**قڕاڵ:** قرژاڵ ف خرچنگ.

**قڕاڵكه:** قڕاكه ف مرغ حق.

**قڕانك:** پوکاوڵە، چەموڵە، چەمبوڵە ف ام کردن با دست، پنجه.

**قڕانگ:** قڕانك، پوکاوڵە، چەموڵە ف ام کردن با دست.

**قڕاوكه:** قڕاكه ف مرغ حق.

**قڕبەسەر:** بریتی لە ژن، مێوینەی بنیادەم ف کنایه از زن.

**قڕبـەسەره:** بریتی لە جنۆکە، وشەیەکە زارۆی پێ دەترسێنن: (مەگری قڕبەسەره هات) ف کنایه از جن.

**قڕقڕ:** داری‌زۆرپڕ لە لق‌و پۆپی تێکەڵاو ف درخت پر شاخ و برگ درهم.

**قڕقڕاندن:** چوقانی ڕۆن، قرچەی ڕۆن ف گداختن روغن.

**قڕقڕاوی:** قڕقڕ ف نگا: قڕقڕ.

**قڕقڕۆكه:** قڕقڕ ف نگا: قڕقڕ.

**قڕقڕه:** جۆرێ بەری دارمازو ف نوعی ثمر مازوج.

**قڕك:** ۱) پەلکی سپی‌و تورتی بنەوەی کەلەم؛ ۲) باڵدارێکی ڕەش‌و سپیە، کلك‌درێژە، قشقەڵە، قەلەباچکە ف ۱) مغز کلم؛ ۲) زاغچه.

**قڕكردن:** ۱) چنگ قرژکردن؛ ۲) توێژهێنانی ترشاو ف ۱) انگشتان را به شکل چنگك درآوردن؛ ۲) کف برآوردن ترشیده.

**قڕكه:** قڕقڕ ف نگا: قڕقڕ.

**قڕگه:** قڕك، قشقەڵە، قەلەباچکە ف زاغچه.

**قڕگه:** قڕقڕه ف نوعی ثمر مازوج.

**قڕڵ:** چۆقین، تاوانەوەی ڕۆن لەسەر ئاگر ف گداز روغن بر آتش.

**قڕڵان:** هەڵچۆقان ف گداختن.

**قڕڵاندن:** چۆقاندن، قاڵ کردن ف گداختن روغن.

**قڕڵه:** بنکەی چەکداری دەوڵەت لە ئاواییدا، سەربازخانە ف سربازخانه.

**قڕمپال:** گەمەیەکە لەناو کوردستان ف نوعی بازی.

**قڕموك:** قەپوشك، کاسەی گوڵ، ئەوچنگ‌ئاسایەی گوڵی لەسەر وێستاوە. ف کاسهٔ گُل.

**قڕن:** سەرهاتوی موتێك‌هاڵاو ف مو بلند ژولیده‌موی.

**قڕنـگ:** چیگنـە، چنگنـە، جانـەوەرێکە *سوور لە قوڕنو دەکا بەپێستەوە* دەچەسپێ ف حشره‌ایست به پوست می‌چسبد.

**قڕنەسەره:** قڕبەسەره، جنۆکە ف کنایه از جنّ.

**قڕوڵه:** قاڕو ف زاغ پاقرمز.

**قڕه:** دەنگی ڕۆنی چۆقاو ف جزولز.

**قڕەسەر:** موی درێژی سەر ف موی بلند سر.

**قڕەسەرهاتنەوه:** ڕژانی موی سەر ف ریزش موی سر.

**قڕه کردگ:** ترشاوی توێژی‌ترشان‌لەسەر ف ترشیدهٔ کف برآورده.

**قڕه کردن:** توێژگرتنی ترشاو ف کف براوردن ترشیده.

**قڕیاك:** قالاخ، قالاو ف کلاغ.

**قڕین:** زیڕەزیڕ، زەنازەنا ف جیغ و داد و هیاهو.

**قسپ:** ۱) بەلا، تەگەره؛ ۲) داری نیوەئەستوری چوارپێنج‌بستی کە بۆ پەرژین دەی‌چەقێنن یان بەسـەر دارەڕای ڕادەکەن ف ۱) آسیب؛ ۲) قطعه‌چوب یکمتری برای پرچین و پوشش بام.

**قسـر:** ۱) نەزۆك، ئەستێور؛ ۲) داری لەبـەرکـەوتـو؛ ۳) ئاهـەك ف ۱) سترون؛ ۲) درخت از ثمر افتاده؛ ۳) آهك.

**قسقەپان:** ناوی دێیەکە ف نام روستایی است.

**قسقەلا:** ناوی دێیەکە ف نام روستایی است.

**قسـكل:** جۆرێ بەری مازو،گزگل ف نوعی ثمر مازوج.

**قسڵ:** ئاهەك، قسر ف آهك.

**قسلاو:** دەئاوکراوی ئاهەك ف آب آهك.

**قسم:** جۆر، تەحر ف نوع.

**قسمەت:** چارەنوس، بەشێ کە خوا دەیدا ف سرنوشت، قسمت خدایی.

**قسن:** ۱) شەخس، زیارەتگا؛ ۲) دیواری بەجەغز لە بەرد ف ۱) مزار؛ ۲) دیوارهٔ سنگچین مدوّر.

**قسناخ:** پێوانەیەکی گەنم، قاسناخ ف نگا: قاسناخ.

**قسناغ:** قاسناخ ف نگا: قاسناخ.

**قسني:** بۆن‌خۆشێکی ڕەشە لە شەم دەکا ف موم مانندی سیاه خوشبو.

**قسور:** خەتا، تاوان، سوچ ف قصور، کوتاهی کردن در کار.

**قسه:** ئاخافتن، پەیڤ ف سخن.

**قسەبردن:** شوفاری کردن ف سخن‌چینی.

**قسەبڕین:** بڕ بە پەیڤینی کەسێ دان ف توی حرف آمدن، گفتار کسی را قطع کردن.

**قسەبڕینەوه:** پێك‌هاتن لەسەر کارێ ف بر سر موضوعی توافق کردن.

**قسەبەر:** شوفار، دوزمان ف سخن‌چین.

**قسەپەڕاندن:** ۱) ڕاواندن؛ ۲) درکاندنی نهێنی ف ۱) هذیان گفتن؛ ۲) دهن لقی.

**قسەپەڕێن:** تێدانەوەستاو، زارشڕ ف دهن لق.

**قسەپێ گوتن:** قسەپێ‌وتن ف نگا: قسەپێ‌وتن.

**قسـەپێ‌وتن:** ۱) جوێن‌پێدان؛ ۲) سەرکۆنەکردن ف ۱) دشنام دادن به کسی؛ ۲) کسی را سر زنش کردن.

**قسەت:** پەیڤێ‌تە ف سخنت.

**قسەتاڵ:** مرۆی کە ئاخافتنی نەخۆش دبێژە ف تلخ زبان، آنکه سخنان ناخوشایند می‌گوید.

**قسەتان:** پەیڤێ ئێوە ف سخنتان.

**قسەخواردنەوه:** پەژیوان‌بونەوە لە ئاخافتنی خۆ ف پشیمانی از سخن خود.

**قسەخۆش:** زمان‌شیرن ف خوش گفتار.

**قسەدابڕین:** دەنگ‌گۆڕێن لە گشت ف قهرکردن از گفتگو با کسی.

**قسەدرست:** خاوەن‌بەڵێن ف درست پیمان.

**قسەدركاندن:** ئاشکراکردنی نهێنی ف فاش کردن راز.

**قســەدوڕانــدن:** ۱) درکاندنی راز؛ ۲) بێ‌فایدەچوُنی قسە ف ۱) فاش کردن راز؛ ۲) بیهودەرفتن سخن.

**قسەدەراوردن:** ۱) درۆکردن؛ ۲) پێ‌درکاندنی راز ف ۱) دروغ‌بافی؛ ۲) بەاعتراف وادار کردن، حرف کشیدن.

**قسەدەرکیشان:** نهێنی‌پێ‌درکاندن ف حرف کشیدن.

**قسەدەرهاوردن:** قسەدەراوردن ف نگا: قسەدەراوردن.

**قسەدەرهێنان:** قسەدەراوردن ف نگا: قسەدەراوردن.

**قسەراست:** درۆنەکەر ف راستگو.

**قسەڕاکێشان:** پێ‌درکاندنی نهێنی ف از زیر زبان کشیدن.

**قسەڕاواندن:** راواندن ف هذیان گفتن.

**قسەرەق:** قسەتاڵ ف تلخ زبان، آنکە سخن ناخوشایند گوید.

**قسەڕەوا:** کەسێ کە بەقسەی دەکرێ ف کسی کە سخنش خریدار دارد.

**قسەزان:** زمان پاراو ف سخندان.

**قسەزل:** بەبافیش ف مبالغەگو.

**قسەسارد:** پەیڤ‌نەخۆش، بەرانبەر بە قسەخۆش ف سردگفتار.

**قسەشکاندن:** بەقسەنەکردن، تکانەگرتن ف خواهش نپذیرفتن.

**قسەقوت:** کەسێ کە قسەی سەیر دەکا ف نکتەسنج، بذلەگو.

**قسەقوُت‌دان:** تەواو راست نەگوتن ف تمام حقیقت را نگفتن.

**قسەقوُت‌دانەوە:** قسەخواردنەوە ف از گفتۀ خود پشیمان شدن.

**قسەکەر:** نوێنەر بۆ قسەکردن ف سخنگو.

**قسەگێڕەوە:** تیانەوەستاو، زمان‌شڕ ف دهن لق.

**قسەلەڕو:** کەسێ ڕەپ‌وڕاست قسە دەکا ف رك‌گو، صریح در گفتار.

**قســەلەسەرداکێشان:** قسەدەرهاوردن، راستی‌پێ‌درکاندن ف وادار بە اعتراف کردن، زیر زبان کشیدن.

**قسەلێ‌دەرکێشان:** راستی‌پێ درکاندن ف زیر زبان کسی را کشیدن.

**قسەلێ‌درهێنان:** قسەلێ دەرکێشان ف زیر زبان کسی را کشیدن.

**قســەلێ‌ڕاکێشــان:** قسەلێ دەرکێشان ف زیر زبان کسی را کشیدن، حرف از کسی کشیدن.

**قسەلێ‌کردن:** باس کردنی شتێ ف دربارۀ موضوع گفتگو کردن.

**قســەمێچکــە:** ۱) مەرایی‌کەر، دوزوان؛ ۲) دەم‌خاوی حیزانــە ف ۱) ریاکار؛ ۲) مردی کە زنانە سخن می‌گوید.

**قسەناخۆش:** قسەتاڵ ف تلخ زبان.

**قسەنەبوُن:** ۱) قاربون: (ئێمە بەیەکەوە قسەمان نیە)؛ ۲) رازی‌بوُن : (باوابێ قسەم‌نیە) ف ۱) قهر بودن؛ ۲) راضی بودن، رضایت دادن.

**قسەنەستەق:** کەسێ قسەی پڕکاکڵ‌و زانایانە دەکا ف نغزگوی اندرزگو.

**قسەوباس:** دەنگ‌وباس ف اخبار.

**قسەوتن:** جوێن‌دان ف دشنام دادن.

**قسەوەرگرتن:** گوێ‌دان‌و تێگەیشتن ف شنفتن و فهمیدن سخن.

**قسەهەڵبەست:** بوختان‌وێژ ف آنکە بُهتان می‌زند.

**قسەهەڵبەستن:** بوختان کردن ف بُهتان زدن.

**قسەهەڵچنین:** زمان‌شڕی، قسەبردن، دوُزمانی ف سخن‌چینی.

**قسەهێنان:** قسەبردن ف سخن‌چینی.

**قسەی‌پێشینان:** پەندی پێشونان ف پند گذشتگان.

**قسەی‌نەستەق:** قسەی پڕ لە ئامۆژگاری ف سخن ارزندە و آموزندە.

**قسیە:** قسە، ئاخافتن ف سخن، حرف.

**قش:** گاشەبەردی زل لە چیادا ف صخرۀ بزرگ در کوە.

**قشپل:** پشکەڵ ف پشکل.

**قشت:** ۱) پەرچوُکەی بان توێڵ؛ ۲) جوانکیلە، خونچیلانە ف ۱) موی پیشانی؛ ۲) کوچولوی نازنازی.

**قشتن:** جۆرێ خوێندنی قالاو ف نوعی صدای بخصوص کلاغ.

**قشتیلانە:** خونچیلانە ف کوچولوی نازی.

**قشتیلە:** قشتیلانە ف کوچولوی نازی.

**قشقونە:** پاڵوی زین ف پاردم اسب.

**قشقەڕە:** ۱) قژگ؛ ۲) زەنازەنا ف ۱) زاغچە؛ ۲) جنجال.

**قشقەڕەق:** زەنازەنا ف هو و جنجال.

**قشقەڵە:** قژگ ف زاغچە.

**قشکە:** قژقژە، قژگە ف نوعی ثمر مازوج.

**قشلاخ:** دوگوندی کوردستان بەم ناوە بەعسی کاولی کردوە ف دو روستا بە این اسم در کردستان توسط بعثیان ویران شدە است.

**قشڵاخ:** ۱) زستانەوار؛ ۲) دێی دابڕاو لە دێی گەورە؛ ۳) شوێنێکە لە لای سنە کە بەندی لێ هەڵبەستراوە ف ۱) قشلاق؛ ۲) دهکدۀ جداشدە از دە بزرگ؛ ۳) محلی نزدیك سنندج کە سدّی درآن بناشدە.

**قشلاخەروتە:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان کە توسط بعثیان ویران شد.

**قشــڵاخی‌کۆن:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان کە بعثیان آن را ویران کردند.

**قشڵاغ:** قشڵاخ ف نگا: قشڵاخ.

**قشلان:** دوگوندی کوردستان بەم ناوە بەعسی کاولی کردوە ف دو روستا بە این اسم در کردستان توسط بعثیان ویران شدە است.

**قشلك:** گیایەکە وەك ئالقەتیز دەچێ ف گیاهی است.

**قشڵە:** قژڵە ف سر بازخانە.

**قغەقغ:** دەنگی قالاو، قڕقڕی قەلەڕەشە ف صدای کلاغ.

**قف:** دەنگێ کە لە بێماری سی‌یەوە لە قڕقڕاگە دەردەچێ، کۆکە، کۆخە ف سرفە.

**قفك:** سەبەتەی لەپوُشی بەدەسك، زەنبیلەی زل ف زنبیل بزرگ دستەدار.

**قفڵ:** ئامرازێکی داخستنە بە ئاچەر دەکرێتەوە، گۆڵە ف قفل.

**قفڵبەند:** جۆرێ دانانی خشت‌و بەرد لەدیواردا ف قفلبند.

**قفڵ‌دان:** داخستن بە قفڵ ف قفل‌زدن.

**قفڵ‌دران:** داخران بە قفڵ ف بستە شدن با قفل.

**قفڵ‌دراو:** داخراو بە قفڵ ف باقفل بستەشدە، قفل شدە.

**قفڵ‌کردن:** قفڵ‌دان ف قفل کردن، قفل زدن.

**قفڵ‌لێدان:** قفڵ‌دان ف قفل زدن.

**قفڵ‌لێدران:** بەقفڵ داخران، قفڵ‌دران ف بستەشدن با قفل.

**قفلْ لێدراو:** بەقفلْ داخراو، قفلْ دراو ف بستەشدە با قفل.

**ققە:** قف ف سرفە.

**ققین:** ققەکردن، کۆخین، کۆکین ف سرفەکردن.

**ققە:** شیرنی لەزمانی زاروکاندا، قاقە ف شیرینی در گویش بچەها.

**قل:** ۱) چلْ، تەنیا لاسکێك؛ ۲) یەكدەنْك؛ ۳) ناو لەپ: (بیخە قلمەوە) ف ۱) تنها یك ساقە؛ ۲) یك دانە؛ ۳) کف دست.

**قلاپیك:** بەدەن، قالب، لەش ف کالبد.

**قلاخ:** ۱) تەپالەی وشك، دەوە، قالاخ؛ ۲) جێگەی تەپاڵەتێ کردن ف ۱) تاپالە؛ ۲) تاپالەدان.

**قلاخدان:** شوێنێ کە تەپاڵەی تیا عەمار دەکەن ف تاپالەدان.

**قلادە:** ۱) ئالقەی ملی تاژی ڕاو؛ ۲) ئالقەی خشلی ئەستۆ ف ۱) قلادۀ سگ شکاری؛ ۲) گردنبند زینتی.

**قلاش:** لەت، شەق ف شق، دونیم.

**قلاشتن:** شەق کردن ف دونیمەکردن.

**قلاشکەری:** بڕەداری ئەستوری لێرەوار بۆ سوتاندن ف کندۀ جنگلی برای هیزم.

**قلاق:** قالاو ف کلاغ.

**قلانقوزان:** کاردو، کاردی ف گیاهی است آشی.

**قلاوچ:** بەسەریەکدا کردن تا بلند دەبێ، قەلانقوچکە ف برهم انباشتن.

**قلپ:** ۱) دەنگی جۆشـــانـی ئاو؛ ۲) دەنـگی رژانی ئاو لە دەفـــری مل باریکـدا؛ ۳) سەرنخوُن؛ ۴) برێتی لە نەمان و لەبەین چوُن ف ۱) صدای غلغـل آب؛ ۲) صدای ریزش آب از ظرف دهـانـه تنگ؛ ۳) واژگون؛ ۴) کنایە از نابودشدن.

**قلپاندن:** ۱) وەجۆش هاوردنی ئاو لەسەر ئاگر؛ ۲) رژاندنی ئاو لە دەفری مل تەنگەوە ف ۱) جوشانیدن آب؛ ۲) ریختن آب از ظرف دهانە تنگ.

**قلپاندنەوە:** ۱) رژاندنی ئاو لە دەفری مل تەنگ؛ ۲) لەبەین بردنی ماڵ ف ۱) ریختن آب از ظرف دهانەتنگ؛ ۲) نابودکردن مال.

**قلپ بوُنـەوە:** ۱) سەرەونخوُن بوُن؛ ۲) برێتی لە لەبەین چوُن، نەمان ف ۱) واژگوُن شدن؛ ۲) کنایە از نابودی.

**قلپك:** قرپ، قورقێنە ف آروغ.

**قلپکردنەوە:** قلپاندنەوە ف نگا: قلپاندنەوە.

**قلپ و قوپ:** دەنگی ڕشانەوەو هێلنج دان ف صدای قی کردن و تهوّع.

**قلپە:** دەنگی ڕژانی ئاو لە دەفری تەنگ ف صدای ریزش آب از ظرف دهانە تنگ.

**قلپـەقلپ:** دەنگی زۆری ڕژانی ئاو لە دەفـری دەم تەنگـەوە ف صدای ریزش پیاپی آب از سبوی دهانە تنگ.

**قل پەنجە:** دەست لە ناو دەست ف پنجەدرپنجە.

**قلت:** دەنگی جۆشینی ئاو ف صدای جوشیدن آب.

**قلتیان:** جۆشینی ئاو لەسەر ئاگر ف جوشیدن آب بر آتش.

**قلچك:** ۱) ئامرازی قنگر و بنەگیا دەرێنان، پیشگان؛ ۲) قوڵی کەوا؛ ۳) قونچکی مێوژو ترێ؛ ۴) داسو؛ ۵) چرنوکی پاساری و مەلی پچوُك ف ۱) ابـزار کنگـرکندن؛ ۲) آستین قبا؛ ۳) دنبالچۀ مویز و انگور؛ ۴) اخگل، سیخچە؛ ۵) چنگال گنجشك و دیگر پرندگان کوچك.

**قلچـك کردن:** ۱) قونچـك لێ کردنـەوە؛ ۲) تەقڵە بەپـاساری کردن لە جەنگەی زەماوندو دەهۆلْ و زوڕنالێدان دا ف ۱) برداشتن دنبالچۀ مویز و انگور؛ ۲) بەهواپراندن گنجشك در بزم عروسی.

**قلخ:** ۱) برینـــگ، برنـگ؛ ۲) قرخ، موُی کورتێ کە درێژ نابێ ف ۱) دوکارد، قیچی پشم‌زنی؛ ۲) موی کوتاه بی‌رشد.

**قلخـان:** دڕکێکـە بۆسـوُتـەمەنی بەکار دێ ف خار است کە بە مصرف سوخت می‌رود.

**قلخە:** دەنگی خڕخڕی گەروُ لە پیری یا نەخۆشی ف صدای خرخر گلو از پیری یا بیماری.

**قلخەقلخ:** قلخەی لەدوی یەك ف «قلخە»ی پیاپی.

**قلرخ:** دوگوندی کوردستان بەم ناوە بەعسی کاولی کردوە ف دو روستا بە این اسم در کردستان توسط بعثیان ویران شدە است.

**قلغ:** ۱) تەحر و دیدار، بیچم؛ ۲) بەرگ و شمەکی شڕ و دڕاو ف ۱) ریخت و قیافە؛ ۲) لباس ژندە.

**قلف:** ۱) ئالقە، قەف؛ ۲) دەسکی دەفر، ۳) قفلْ، گوڵە ف ۱) حلقە؛ ۲) دستگیرە؛ ۳) قفل.

**قلقك:** ۱) نێسکی نەرم کە دادە کرۆژرێ، قرقرتۆك؛ ۲) شمشێرەی درگا ف ۱) کرکرە، غضروف؛ ۲) کلید کلون چوبی در.

**قلقل:** ۱) بەری گیایەکە لە نیسك دەکا؛ ۲) چلْ چلْ؛ ۳) دەنکەدەنکە ف ۱) ثمر گیاهی است عدس مانند؛ ۲) شاخەشاخە؛ ۳) دانەدانە.

**قلْك:** ۱) جەوت، جفت؛ ۲) کلاوی بەڕو ف ۱) جفت؛ ۲) کلاهك بلوط.

**قللە:** قلْك ف نگا: قلْك.

**قلم:** قلپ ف نگا: قلپ.

**قلموُیچ:** ریپۆق ف ژفك، قی چشم.

**قلنج:** ۱) شمشێر؛ ۲) بن هەنگڵ ف ۱) شمشیر؛ ۲) زیر بغل.

**قلو:** نوخشانەی خراپ، پێش گوتنی نەباش ف فال بدزدن.

**قلوت:** زەوی نەوی کە ئاوی تێدا دەوێستێ ف زمین پست.

**قلوُج:** پشت چەماو، کوُڕ ف خمیدە، کوژپُشت.

**قلوچ:** ۱) خێل؛ ۲) کەسێ چاوێکی لە چاوێکی پچـوکتـرە؛ ۳) شاخی حەیوان ف ۱) لوچ؛ ۲) کسی کە یکی از چشمانش کوچکتر است؛ ۳) شاخ حیوان.

**قلور:** ناوبەتاڵ ف کاوك میان تهی.

**قلوز:** ۱) نێری شاخ بلنـــدو راست؛ ۲) برێتی لە بادی هەوا ف ۱) شاك شاخ بلند وراست؛ ۲) کنایە از خودبین متکبّر.

**قلوزان:** ۱) سەرمـەقـولات؛ ۲) تەقلەلێدانی کەڤۆك ف ۱) پُشتك؛ ۲) پُشتك زدن کبوتر هنگام پرواز.

**قلوُژ:** کۆمەڵ بوُن، بەسەریەکداکۆوە بوُن ف برهم انباشتەشدن.

**قلوُمك:** ۱) قەڵەمەی ناژتن؛ ۲) وەڕەز لەبەر باری بەقەوەت؛ ۳) ژانی دڵ ف ۱) قلمە؛ ۲) خستە از بارگران؛ ۳) دل درد.

**قلە:** ۱) سکڵی تەواوسـوُر؛ ۲) سوُربـوُنەوەی سکڵ بێ ڕەشایی ف ۱) اخگر تمام افروختە؛ ۲) افروختگی اخگر.

**قلهـ:** بیچم، تەحر، تەرح و دیدار [ف] سیما، قیافه.

**قلەپۆپە:** دوند، سەرلوتکەی بەرزی چیاو دار [ف] بالاترین نقطه، اوج، قلّه.

**قلەقل:** گرشەگرشی پۆلو [ف] درخشش افروختگی اخگر.

**قلەکـاوە:** گونـدێکە لەکوردستان بەعسی وێرانی کرد [ف] از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**قلی:** قانەقدی، قدیلکە [ف] غلغلك.

**قلێ:** ۱) دەنکێ؛ ۲) چلێ [ف] ۱) یکدانه؛ ۲) یکشاخه.

**قلیان:** ۱) نێرگەلە، قەنەنەی ئاوی؛ ۲) سەبیلەی کلكدرێژ [ف] ۱) قلیان؛ ۲) چپق دستەبلند.

**قلیانئاوی:** نێرگەلە [ف] قلیان.

**قلیانقاوەڵتوٚن:** ناشت، خواردنی سەرلەبەیانی [ف] خوراك قبل از صبحانه.

**قلیانقاوەڵتی:** قلیانقاوەڵتوٚن [ف] خوراك قبل از صبحانه.

**قڵیاو:** ۱) بۆلاوی سابـوٚن؛ ۲) زاخی رەش کە بۆ دەرمان دەشێ [ف] ۱) خاکستراب صابون‌سازی؛ ۲) زاج سیاه.

**قلی‌بلی:** قسەی وا کە تێ نەگەن [ف] سخنان نامفهوم.

**قلێ‌بلێ:** قلی بلی [ف] سخنان نامفهوم.

**قلیج:** ۱) ناوی گوندێکە؛ ۲) شمشێر [ف] ۱) نام دهی است؛ ۲) شمشیر.

**قلیجـە:** گونـدێکی کوردستـانە بەعسی کاولی کرد [ف] نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**قلیچ:** ۱) رێبۆقی چاو؛ ۲) چاوێك پچوٚك یەكزل؛ ۳) قامکی گچکە [ف] ۱) ژفك، قی چشم؛ ۲) چشمی از چشمی کوچکتر؛ ۳) انگشت کوچکه.

**قلیچان:** قامکەتوٚتە، تیلیابیچك [ف] انگشت کوچکه، خنصر.

**قلیچك:** داروە کازێکە سەری وەك خاچ وایە [ف] نوعی عصای دست.

**قلێچکە:** جەمسەری دو، کلێنچکە [ف] دنبالچه.

**قلێچە:** گیایەکە [ف] گیاهی است.

**قلێر:** گەمار، پیس، چڵکن [ف] کثیف.

**قلێزەنگی:** چێشتێکە لە برنج و ئالو بخارا [ف] غذایی است از برنج و آلو بخارا.

**قڵیش:** ۱) درز؛ ۲) درزی گوشاد [ف] ۱) درز؛ ۲) شکاف گشاد.

**قڵیشـــان:** ۱) درزبـــردن؛ ۲) لەبـــەرێەك‌چوٚن [ف] ۱) درز بردن، ترك برداشتن؛ ۲) شکافته‌شدن.

**قڵیشاندن:** ۱) لەبەرێەك‌بردن؛ ۲) دەرزپێدان [ف] ۱) شکافتن؛ ۲) ترکاندن.

**قڵیشاندنەوە:** قڵیشاندن [ف] نگا: قڵیشاندن.

**قڵیشانن:** قڵیشاندن [ف] نگا: قڵیشاندن.

**قڵیشاننەوە:** قڵیشاندن [ف] نگا: قڵیشاندن.

**قڵیشانەوە:** قڵیشان [ف] نگا: قڵیشان.

**قڵیشاو:** ۱) درزبردو؛ ۲) لەبەرێەك‌چوٚگ [ف] ۱) ترکیده؛ ۲) شکافته.

**قڵیشاوە:** قڵیشاو [ف] نگا: قڵیشاو.

**قڵیشیاو:** قڵیشاو [ف] نگا: قڵیشاو.

**قڵێف:** ۱) کالان؛ ۲) بەرگی شت [ف] ۱) غلاف؛ ۲) پوشش.

**قڵێفشکوٚفە:** قوٚزاخەی پەموٚ [ف] غوزهٔ پنبه.

**قلیك:** شمشێرەی درگا [ف] کلید قفل چوبین در.

**قلێك:** ۱) توٚزقاڵێك، کەموسکەیەك؛ ۲) تاکەچلێك؛ ۳) دەنکێ، دانەیێك [ف] ۱) اندکی؛ ۲) یك شاخه؛ ۳) یك دانه.

**قلێل:** ۱) کون‌تێ‌بوٚن؛ ۲) کوناودیو [ف] ۱) سوراخ شدن؛ ۲) سوراخ شده.

**قلێنج:** ۱) قلیج، شمشێر؛ ۲) قامکەتوٚتە [ف] ۱) شمشیر؛ ۲) انگشت کوچکه.

**قلێنجك:** قامکەتوٚتە [ف] انگشت کوچکه.

**قلینچك:** قامکەتوٚتە [ف] انگشت کوچکه.

**قلێنچك:** قلیچکە، کلێنچکە [ف] دنبالچه.

**قلینچکەسلام:** پاپشکێو [ف] گل مژه.

**قلی‌وبلی:** قلی‌بلی [ف] نگا: قلی‌بلی.

**قڵیە:** ۱) خوٚڵەکەوەی سابوٚن؛ ۲) جوٚرێ چێشتە [ف] ۱) خاکستر صابون سازی؛ ۲) آش قلیه.

**قم:** ۱) رەمڵ، رەڵم؛ ۲) بناوبوٚن؛ ۳) فڕ، فڕێ لە خواردنەوە [ف] ۱) ماسه؛ ۲) زیرآب شدن؛ ۳) جرعه.

**قمار:** ۱) بازی، کایە؛ ۲) گەپ‌وگاڵتە؛ ۳) حیلە [ف] ۱) بازی؛ ۲) شوخی؛ ۳) نیرنگ.

**قمارباز:** حیلەباز [ف] مکّار.

**قمباو:** ئاوداشتنێ کە زەرعات داپوٚشێ [ف] آبیاری که کشت را بپوشاند.

**قمقموٚر:** رەهوٚلی تەنگ‌و تاریك [ف] دهلیز تنگ و تاریك.

**قمقمـوٚك:** ۱) خەمـەگرٚو؛ ۲) دەفری ئاوی سەفەر، مەتارە؛ ۳) تونگەی مل‌باریك [ف] ۱) نوعی چلپاسه، بزمجه؛ ۲) قمقمه؛ ۳) تُنگ گردن باریك.

**قمقموٚکە:** قمقموٚك [ف] نگا: قمقموٚك.

**قمل:** جانەوەرێکی بوٚری بچوٚکەبوٚ دەخڵ *زیانی* هەس، سن [ف] حشرهٔ سن.

**قملاخ:** ۱) زەمینی روٚچوٚگ؛ ۲) جلێتاو [ف] ۱) زمین فرورفته؛ ۲) گل و لای.

**قمیش:** ڕێگە بە بن زەویدا، نەغمە [ف] نقب، تونل.

**قن:** ۱) جێ‌سانـەوەی باڵنـدەی خوٚماڵی لە شەودا، کولانەمریشك؛ ۲) کونی پشتی گیاندار کە پیسایی پێدا دێت؛ ۳) کاکڵی گوێزو بادام؛ ۴) بنـەمـای وشـەی ڕزین. *لەپاش «دا» دەیڵێن* : (تەواو داقناوە) [ف] ۱) آشیانهٔ ماکیان؛ ۲) کون؛ ۳) مغز بادام و گردو؛ ۵) پوسیدن.

**قنار:** چنگی درندەو باڵداری ڕاوکەر [ف] چنگال درنده و پرندهٔ شکارچی.

**قنـان:** ڕزان، لەکەڵك کەوتن. *پاش پێشگر «دا» دەیڵێن* [ف] پوسیدن و از کار افتادن.

**قنب:** کوٚلی دارین بوٚ دوٚشـــاو تێداگوشین، گوشینگـەی ترێ لە دار بوٚ پلێخاندنەوەی ترێ [ف] معصرهٔ چوبین در شیره‌سازی.

**قنج:** ١) راست، رەپ؛ ٢) زوپ، زەق ف ١) راست ایستاده؛ ٢) برجسته.

**قنجك:** پیچك، كەمێك، تۆزێك ف اندكی.

**قنجكان:** ترۆشكان ف چنباتمه‌نشستن.

**قنج كردنەوە:** راست كردن دوای چەمانەوە ف راست كردن بعد از خمیدگی.

**قنج‌وقیت:** راست‌و بێ‌گرێ بەسەرپاوە ف استوار و پابرجا.

**قنجەزەرد:** گیایەكی پتەوی قایم‌و لوسە ف گیاهی است.

**قنجەقنج:** خۆرانان‌و جحێڵی كردن ف خودنمایی و جوانی كردن.

**قنچك:** ١) دەسكی باریكی دەنكەترێ‌و مێوژ؛ ٢) كەموسكەیەك؛ ٣) زیپكە ف ١) دنبالهٔ دانه انگور و مویز؛ ٢) اندكی از چیزی؛ ٣) جوش بر پوست.

**قنچكان:** چینچكان، ترۆشكان ف چمباتمه.

**قنچكاو:** جێگەی ریبوق لە چاو، سوچی چاو ف گوشهٔ چشم.

**قنچكە:** زیپكە، زیرك ف جوش پوست.

**قنچكەسلاو:** باپشكێو ف گل مژه.

**قنچكەسلاوە:** باپشكێو ف گل مژه.

**قنس:** پاژ، پارچە ف قسط.

**قنك:** قن، كولانەمریشك ف آشیانهٔ ماكیان.

**قنگ:** قن، كونی پاشەوەی گیاندار ف كون.

**قنگانیسك:** ١) راكشان بە ئانیشك‌هەڵدانەوە؛ ٢) ئانیشك ف ١) دراز كشیدن و بر آرنج تكیه‌دادن؛ ٢) آرنج.

**قنگاو:** پاشاو، ئاوێ لە زەوی دەردەچێ ف پسابهٔ آبیاری.

**قنگاڵە:** گیای خوسیلك ف گیاهی است دارای شیرهٔ مسهل.

**قنگ‌بەگێچەڵ:** ١) ئاژاوەچی؛ ٢) هەمیشە خەریك‌و پڕكار ف ١) فتنه‌انگیز؛ ٢) پركار.

**قنگچاو:** تیلچاو، سیلەی چاو ف گوشهٔ چشم.

**قنگ‌خوران:** بریتی لە حیزبوون ف كنایه از كونی شدن.

**قنگ‌خوراندن:** بریتی لە ئیشتیا لە كردنی كارێك نەبوون ف كنایه از اهمال كردن.

**قنگ‌خوروكە:** نەخۆشیەكی ئاژەڵە ف نوعی بیماری دام.

**قنگدان:** گاندانی نێر ف كون دادن.

**قنگدانەوە:** بریتی لە رۆنیشتن: (دەوەرە **قنگی‌بدەوە** با ئیسراحەت كەی) ف كنایه از نشستن.

**قنگدە:** نێری حیز ف كونده.

**قنگدەر:** قنگدە ف كونده.

**قنگر:** گیایەكی دڕكاوی‌یە لاسكەكەی دەخورێ، كەنگر ف كنگر.

**قنگرپاچ:** بنەكەنگر ف بوتهٔ كنگر.

**قنگرتن:** فێرەرۆیشتن‌بوونی زاروڵ ف نشستن یادگرفتن بچه.

**قنگرواچ:** قنگرپاچ ف بوتهٔ كنگر.

**قنگرەزا:** چەوی كەنگر ف انگم كنگر.

**قنگلاشك:** قانگەلاشك ف نگا: قانگەلاشك.

**قنگ‌لێ‌كەوتو:** بریتی لە مرۆی شل‌و شەویق‌و ئاگالەخۆنا ف كنایه از آدم مهمل.

**قنگەبان:** گوێسوانەی پشت بان، سوانەی پشتەوەی بان ف لبهٔ عقبی بام.

**قنگەجن:** بریتی لە شوێنی تەنگەبەر ف كنایه از جای تنگ.

**قنگەجنۆكە:** قنگەجن ف كنایه از جای تنگ.

**قنگەجۆرە:** ئێسكی پاشقنگی مریشك ف استخوانبندی تخمدان مرغ.

**قنگەجوڵە:** بریتی لە پەلەكردن بۆ رۆیشتن ف كنایه از شتاب برای رفتن.

**قنگەجوڵێ:** قنگەجوڵە ف نگا: قنگەجوڵە.

**قنگەخشكێ:** لەسەر قنگ خزین ف بر باسن خزیدن.

**قنگەخلیسكێ:** لەسەر سمت خۆخلیسكاندن ف بر باسن لیز خوردن.

**قنگەخەو:** ١) خەوتن بە رۆیشتنەوە؛ ٢) سەرخەو ف ١) نشسته خوابیدن؛ ٢) پینكی، خواب مختصر.

**قنگەدڕك:** دڕوی كەنگر ف خار كنگر.

**قنگەزە:** رەسەن، رەچەڵاك ف نسل.

**قنگەسوتەكە:** ١) ئافاتێكی مەرەزەیە؛ ٢) نەخۆشیەكی زارۆی ساوایە ف ١) یكی از آفات شالی؛ ٢) نوعی بیماری بچه‌ها.

**قنگەشەڕ:** وردە جەنگ، پەلامارو راكردن ف جنگ و گریز.

**قنگەقنگ:** بریتی لە خۆدزینەوە لە كار ف كنایه از اهمال كردن در كار.

**قنگەگاز:** برینی پشتی یەكسم لە زین‌و كورتان ف زخم پشت ستور از پالان وزین.

**قنگەگان:** نێربازی ف همجنس‌بازی مردان.

**قنگەلاشك:** قانگەلاشك ف ساقه كنگر بادبرده.

**قنگەلتس:** تۆتەكانی سەگ‌و گورگ ف چمباتمهٔ سگ و گرگ.

**قنگەلفس:** قنگەلتس ف چمباتمهٔ سگ و گرگ.

**قنگەنشین:** زاروێ كە فێری دانیشتن بوە ف كودكی كه نشستن یادگرفته.

**قنگەنشینكە:** قنگەنشین ف نگا: قنگەنشین.

**قنگەنشینە:** قنگەنشین ف نگا: قنگەنشین.

**قنگەوتلوڕ:** لەسەر دەم درێژبوگ ف دَمَر دراز كشیده.

**قنگ‌هەڵتەكێنە:** بەرگایلكە ف دم جنبانك.

**قنە:** رۆیشتنی كۆتر و كەو ف خرامیدن كبوتر و كبك.

**قنەقن:** قنەی لەدوی یەك ف خرامیدن پیاپی.

**قنیات:** سەبوری ف شكیبایی.

**قوُ:** ١) قاو، بانگی بەتوند؛ ٢) باڵندەیەكە لە قاز سپی‌تر و زلتر ف ١) فریاد، بانگ؛ ٢) پرندهٔ قو.

**قواڕ:** خۆڵەكەوەی بزیسكی تەنور ف خاكستر تنور.

**قواش:** ١) كوتاڵ، ماڵی گەزی؛ ٢) شت، جۆر ف ١) قماش، پارچه؛ ٢) نوع، طور.

**قواقو:** زەنازەنا ف غوغا، هیاهو.

**قوب:** ١) بانی بەتاق دروسكراوی بڵند، گومەز؛ ٢) دوگمە؛ ٣) زوپ، زەق ف ١) گنبد؛ ٢) دكمه؛ ٣) برجسته.

**قوبا:** ماستی باش‌نەمەیوی شل‌و خراپ ف ماست خوب بند نیامدهٔ

شُل.

**قوباله:** دۆلاّبی دیواری ئۆده بۆ جێگەی نوێن ف کُمُد جای رختخواب.

**قوبان:** ۱) زوپ؛ ۲) رۆچوُن؛ ۳) وشەی حورمەت، قوربان: (رێی کانی قوبــان مونتــەزیری جلوەیی نازە) «گۆران» ف ۱) برجستــه؛ ۲) فرورفتن؛ ۳) کلمهٔ احترام، قربان.

**قوباندن:** ۱) زوپ کردن، زەق کردن؛ ۲) رۆچواندن ف ۱) برجسته کردن؛ ۲) فروبردن.

**قوببه:** ۱) قوب، گونبەز، گونبەت؛ ۲) دروشمی سەرشانی ئەفسەران؛ ۳) دوگمـەی جلك: (قوببەی نوقەبا بێ لە قەبا بێ نەقوبابێ) «نالی» ف ۱) گنبد؛ ۲) سردوشی افسران؛ ۳) دکمه.

**قوبك:** ۱) زوپ؛ ۲) گونبەز ف ۱) برجسته؛ ۲) گنبد.

**قوبکە:** ۱) قوبك؛ ۲) ترۆپکی چیا ف ۱) نگا: قوبك؛ ۲) قلّهٔ کوه.

**قوبلە:** روُگە ف قبله.

**قوبلی:** قبوُلی ف نگا: قبوُلی.

**قوبوُل:** قبوُل ف قبول.

**قوبە:** ۱) قوببە؛ ۲) ناوی گوندێکە ف ۱) نگا: قوببه؛ ۲) نام دهی است.

**قوپ:** ۱) فرێ ئاو؛ ۲) رۆچوُن ف ۱) جرعه؛ ۲) فرورفتگی.

**قۆپ:** ۱) پشت چەماو؛ ۲) دەست وپێ سەقەت ف ۱) کوژ، خمیده پشت؛ ۲) دست و پافلج.

**قوپان:** رۆچوُن ف فرورفتن.

**قۆپان:** گیاجاڕی تایبەتی بۆ لەوەڕی ئاژەڵ ف چراگاه اختصاصی.

**قوپاندن:** رۆچواندن، قوباندن ف فروبردن.

**قۆپاندن:** داهێنانەوە، لارکردنەوە ف کج کردن.

**قوپاو:** رۆچوُگ ف فرورفته.

**قۆپ بوُن:** ۱) خواروگێڕ بوُن؛ ۲) داهاتنەوە ف ۱) کج و کوله بودن؛ ۲) خمیدن.

**قۆپچـە:** ۱)دوگمە، بشکۆژ؛ ۲) جۆرێ بەری دارمازو ف ۱) دگمه؛ ۲) نوعی ثمر مازوج.

**قۆپخـان:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**قۆپز:** شات وشوتکەر ف لاف و گزاف کننده.

**قۆپك:** زۆپایی لە ناو تەختاییدا ف برجستگی میان همواری.

**قۆپکە:** ۱) سەری خڕی شتی باریك؛ ۲) ترۆپکی چیا ف ۱) سر گرد جسم باریك؛ ۲) قلّهٔ کوه.

**قۆپۆز:** ۱) بێقلی بەران؛ ۲) جێگەی قایش لە نیری جوتدا ف ۱) پوزهٔ قوچ؛ ۲) وسط یوغ که خیش درآن بندند.

**قۆپەن:** پەڵەگیای بلند لەناو مێرگ و گیاجاڕدا ف قطعه سبزه زار ساقه بلند در مرغزار.

**قۆپی:** ۱) زەلکاوی قامیشەلان؛ ۲) روُنوُس ف ۱) مرداب نیزار؛ ۲) رونویس.

**قوپیان:** قوپان ف فرورفتن.

**قۆپی داس:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**قۆپیە:** ۱) حیله، فێڵ؛ ۲) دزی لە ئەزموُنی فێرگەدا ف ۱) حیله؛ ۲) تقلّب در امتحان.

**قوت:** ۱) زوپ؛ ۲) لەسەر هەست؛ ۳) بڕان؛ ۴) کورت؛ ۵) خەلاس؛ ۶) لێدان ف ۱) برجسته؛ ۲) حسّاس؛ ۳) قطع؛ ۴) کوتاه؛ ۵) تمام شده؛ ۶) زدن.

**قۆت:** روُت: (بە سەری **قۆت** دە گەڕا) ف لخت.

**قوُت:** ۱) پاروُ لە گەروُ چوُنـەخوار؛ ۲) روُت، بێ پۆشاك؛ ۳) زەواد، بژیو: (لە روُت و **قوُتی** وەك من روُ مەپۆشە/ کە **قوُتی** روُتە **قوُتی** عاشقی روُت) «نالی» ف ۱) بلع؛ ۲) لخت؛ ۳) مایهٔ زندگی.

**قوتاب:** قتاو ف نگا: قتاو.

**قوتابخانە:** فێرگەی زاروکان ف دبستان.

**قوتابوُن:** خەلاس بوُن، نەمانی کار یا خواردەمەنی ف تمام شدن.

**قوتابی:** زاروکی فێرگە ف دانش آموز دبستانی.

**قوتـابیان:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**قوتاخ:** منالێ کە بەردەستی وەرزێرە ف نوجوان پیشکار کشاورز.

**قوتـار:** ۱)رزگار: (بە فڕکەفڕك لە دەستی **قوتار** بوُم)؛ ۲) خەلاس بوُن، بڕانەوە: (ئاردمان **قوتار** بوه) ف ۱) رها؛ ۲) پایان.

**قۆتاس:** ناوە بۆ پیاوان ف نام مردانه.

**قۆتاسە:** زەنبەری زێو ف زیور نقره.

**قوتـان:** ۱) لێدان بە دارو مست؛ ۲) کوتـانی دەخـڵ و شتی تر؛ ۳) خۆ کوتـانـە ناو کار؛ ۴) ناوی هۆزێکی کوردە لە کوردستان ف ۱) زدن، کتك کاری؛ ۲) کوبیدن؛ ۳) فضولی؛ ۴) نام عشیره‌ای کردزبان.

**قۆتان:** پێڕك، عەرزێل ف جای اثاثیه در چادر.

**قوُتان:** کەڵك. *مەلێکە زاوەماسی دەکاو قورتمی هەیە* ف مُرغ سقّا.

**قوتان خەلیزە:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**قوتان گەورە:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**قوتاو:** قتاو، قوتاب ف نگا: قتاو.

**قوتاوخانە:** قتاوخانە ف نگا: قتاوخانه.

**قوتاوی:** قتاوی ف شاگرد دبستان.

**قوتایی:** ۱) دارکاری کراو؛ ۲) کوتراو، هاڕدراو؛ ۳) زۆپایی، زەقایی ف ۱) کتك خورده؛ ۲) کوبیده؛ ۳) برجستگی میان هموار.

**قوتب:** پیری تەریقەتی زۆر جێ گەورە ف مرشداعلی.

**قوتبڕاو:** بەش خوراو، بێ بەش ف کسی که سهمش را خورده‌اند.

**قوت بوُن:** سڵ بوُن، هاتە سەر هەست: (کاکە لەچی **قوت بوی؟**) ف با دقّت و حذر گوش دادن.

**قوت بوُنەوە:** ۱) سەربەرزەوە کردن؛ ۲) زەقی لە نەوی پەیدابوُن ف ۱) سر براوردن؛ ۲) برامدگی از هموار پیداشدن.

**قوتتە:** جانو لە ساڵی دوهەمی تەمەنیدا ف کُرّه اسب دوساله.

**قوُت‌چوُن:** لەگەروُ چوُنەخوار ف بلعیده شدن.
**قوتحه:** شتی نایاب و پەسند ف ممتاز، تحفه.
**قوُت‌دان:** بە گەروُدا بەرێ کردن ف بلعیدن.
**قوُت‌دران:** قوُت‌چوُن ف بلعیده شدن.
**قوُت‌دراو:** دە گەروُ هاویژراو ف بلعیده شده.
**قوْتر:** ۱) بارگینی پیری پەك‌کەوتە؛ ۲) ناوی چیایەکە لە موکوریان ف ۱) یابوی لکنته؛ ۲) نام کوهی است.
**قوْترمه:** بەلەك، پوُز ف ساق.
**قوْتـــره:** ۱) نیوەغـــاری نارێك، گورگەلـوْقـە؛ ۲) ئەسپ و ماینێ کە بە گورگەلوْقە دەروا ف ۱) هروله، یورغه؛ ۲) اسب یورتمه.
**قوتف:** سڕی، تەزی سەرما ف کرخ از سردی.
**قوتفین:** تەزین لەسەرمان، سڕبوُن ف کرخیدن از سرما.
**قوتك:** بالاپۆشی بەدوگمەی ناوتێخراوی تا بەر پشتێند، کورتەك، کەوا، مرادخانی ف قبای نیم‌تنه.
**قوْتـك:** ۱) جاش‌بالتـە، بالتـوی تاسـەرزرانی؛ ۲) مەرگی مفـاجا؛ ۳) نەخۆشیەکی ئاژەڵە؛ ۴) کوْخەرەشە ف ۱) پالتو کوتاه؛ ۲) سکته؛ ۳) نوعی بیماری دام؛ ۴) سیاه‌سرفه.
**قوت‌کردن:** ۱) بڕین؛ ۲) خەلاس کردن ف ۱) قطع کردن؛ ۲) به پایان رسانیدن.
**قوُت‌کردن:** ۱) قوُت‌دان؛ ۲) روُت‌کردن؛ ۳) بن‌ئاوخستن ف ۱) بلعیدن؛ ۲) لخت کردن؛ ۳) زیرآب فروبردن.
**قوت‌کردنەوه:** ۱) زوُپ کردنەوه، بەزەقی شان‌دان؛ ۲) بلندکردن، راکردن ف ۱) برجسته‌نشان دادن؛ ۲) بلندکردن.
**قوتکه:** ۱) دوندی چیا؛ ۲) لوُتکەی تەپوْلکە؛ ۳) زوْپی ف ۱) قلّهٔ کوه؛ ۲) بالای تپه؛ ۳) برجستگی.
**قوْتل:** هاومالْ لە دێدا ف اهالی یك آبادی.
**قوتم:** ۱) بنەداری بڕاوی لەزەمیندا ماو؛ ۲) لێدەم، دارکاری بکەم: (ئەزی تە قوتم) ف ۱) تنه‌درخت بریدهٔ در زمین باقی مانده؛ ۲) بزنم.
**قوتن:** لێدەن، دارکاری کەن: (دێ تە قوتن) ف بزنند، کتك‌کاری کنند.
**قوتنی:** پارچەیەکی ڕێ‌ڕێ‌یە بوْ بشتەکەوا دەبێ ف پارچه‌ای است راه‌راه.
**قوتوُ:** قالك، دەفری چکوْلەی بەسەرپوْش بوْ وردەشت ف قوطی.
**قوْتوُ:** خەجالەت، تەریق، فەدی‌کار ف شرمنده.
**قوْتوْل:** ناوی چیایەکە لە کوردستان ف نام کوهی است.
**قوتـوُلـه:** ۱) قوتوی زوْرپچوُك، ۲) چرافتیله ف ۱) قوطی کوچك؛ ۲) چراغ موشی.
**قوته:** ۱) قوتابی؛ ۲) وریاو سلْ ف ۱) شاگردنوآموز؛ ۲) حسّاس و هوشیار.
**قوُته:** ۱) بن‌ئاوکەوتن؛ ۲) قفە؛ ۳) توانای قوُت‌دان؛ ۴) روُتەڵە؛ ۵) قوْڵکە ف ۱) زیرآب شدن؛ ۲) سرفه؛ ۳) یارای بلعیدن؛ ۴) لخت و بی‌نمود؛ ۵) گودال.
**قوْتـــەره:** ۱) بارستی ئەستوُرایی دار؛ ۲) کوْلکە بەئەندازەی ئەستوُرایی دار؛ ۳) بارسـایی دەورانـدەوری دوْلاش ف ۱) قطر تنهٔ درخت؛ ۲) کنده از تنهٔ درخت؛ ۳) قطر محیط سوراخ ناو آسیاب.
**قوتەقوت:** سەرەتاتکێ ف به هرجا سرکشیدن، فضولی.
**قوْتەك:** ۱) قوتك؛ ۲) سوخمەی بێ‌قوْڵ ف ۱) قبای نیم‌تنه؛ ۲) یلك.
**قوْتەل:** ۱) ناوی چیایەکە، قوْتوْل؛ ۲) ناوی چەند ئاواییەکە ف ۱) نام کوهی است؛ ۲) نام چندین آبادی.
**قوُتەل:** روُتی تەواو ف لخت و برهنه.
**قوُتەله:** روُتەڵە ف لختك بی‌نمود.
**قوْتی:** ۱) سلْی، لەسەرهەست‌بوُن؛ ۲) قوتوُ ف ۱) حساسیّت، آمادگی رمیدن؛ ۲) قوطی.
**قوْتی:** ۱) روُتی؛ ۲) قوتوُ ف ۱) برهنگی؛ ۲) قوطی.
**قوُتی:** ۱) روُتی؛ ۲) قوتوُ ف ۱) برهنگی؛ ۲) قوطی.
**قوتیله:** ۱) قوتـوی پچوُك؛ ۲) چرای فتیلە؛ ۳) ئاوێنەی گیرفان ف ۱) قوطی کوچك؛ ۲) چراغ موشی؛ ۳) آیینهٔ جیبی.
**قوْتین:** روُت بوْ سەر دەگوترێ: (پێخواس و سەرقوْتین بو) ف برهنه ویژهٔ سر.
**قوُج:** بەسەریەکاهاتنی پەلکی چاو یان قامکی دەست‌و... ف برهم آمدن پلك یا انگشتان و...
**قوُجان:** قوُج ف نگا: قوُج.
**قوُجانن:** ۱) بەسەریەکاهێنانی پەلك یا قامکانی دەست: (چاو قوُجانن، پەنجەقوُجانن)؛ ۲) وێك‌هێنانی کونی قن: (قنگی قوُجاندوه) ف ۱) برهم آوردن پلك چشم یا انگشتان؛ ۲) بستن سوراخ مقعد.
**قوج‌بلاخ:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.
**قوْجه:** ۱) زوْر لە مێژینە، کەونارا: (دەچمەوە شارەکەی قوْجەموُسڵێ)؛ ۲) شەویلکـەبزاوتن و دەم‌کردنەوە وەك بوْ بنێشت‌جاوین، قەوچە: (ماکەر قوْجـە بوْ نێرەکـەر دەکا) ف ۱) دیرینه، باستانی؛ ۲) آرواره حرکت دادن با دهن باز.
**قوْجەلەر:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.
**قوُجیاگ:** قوُجان بەسەرهاتوُ ف اعضاء بسته‌شده.
**قوُجیان:** قوُجان ف نگا: قوُجان.
**قوْچ:** ۱) بەران؛ ۲) شاخی حەیوان؛ ۳) گرێوە غاری سواران؛ ۴) جوْرێ تەڵە بوْ راوی گورگ و ڕێوی ف ۱) گوسفند نر، قوچ؛ ۲) شاخ حیوان؛ ۳) مسابقهٔ اسب دوانی؛ ۴) نوعی تله برای شکار گرگ و روباه.
**قوُچ:** ۱) بلند؛ ۲) شتێ کە لە خوارەوە پان و کەم‌کەم باریك بێتەوە و بەرز بێتـەوە، مەخـروُتی؛ ۳) نیشـانەی کەوشەن ف ۱) بلند؛ ۲) مخروطی شکل؛ ۳) علامت مرز.
**قوْچاخ:** ۱) چالاك، لەش‌سوُك؛ ۲) بەپێ لە ڕێگە ف ۱) چست، چالاك؛ ۲) بادپا در پیاده‌روی.
**قوْچاغ:** قوْچاخ ف نگا: قوْچاخ.
**قوْچاغه:** جوْرێ سەربەرەڵبێنە کە لاقیش دادەپوْشێ ف نوعی پیش‌بند

زنانه.

**قۆچـان:** ١) سەنـەد، قەبـاڵەی مڵك؛ ٢) بەشێکی گەورە لە کورد کە لە سنـوُری ئەفغـانستان دەژین؛ ٣) ناوی شارێکە کوردی قۆچانی لێ دەژین؛ ٤) باجێکە ساڵانە لە رەعیەت دەسێنرێ ف ١) سند مالکیّت؛ ٢) بخشی عمـده از کردهـا در خراسـان؛ ٣) شهـری که کردهـای خراسان درآن زندگی می کنند، قوچان؛ ٤) باجی سالیانه که ارباب از رعیت وصول می کند.

**قوُچان:** قوُجان ف نگا: قوُجان.

**قوُچاندن:** قوُجانن ف نگا: قوُجانن.

**قوُچانن:** قوُجانن ف نگا: قوُجانن.

**قوُچاو:** قوُجان بەسەرهاتوُ ف چشم بسته، پنجهٔ برهم آمده و... اعضاء بسته.

**قۆچبلاّخ:** گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**قۆچبلاغ:** لەو گونـدانـەی کوردستـانـە کە بە عسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**قۆچبەهدەر:** گیایەکە بۆ رەوانی دەبێ ف گیاهی است مسهل.

**قۆچتێ هەڵدان:** بە شاخ لێدان ف شاخ زدن.

**قۆچدار:** شاخدار ف شاخدار.

**قۆچدان:** قۆچ تێ هەڵدان ف شاخ‌زدن.

**قۆچقۆچانی:** شەڕەشاخ ف شاخ به شاخ شدن.

**قۆچك:** ١) سەرپۆشێکە لە بەرچەنەوە دادەخرێ بۆ زارۆك‌و هێندێك ژنی عێلاتی یە؛ ٢) ئەنگـوچکـەسـۆرانی، لەوەنـدی ف ١) کلوتهٔ زنانه و بچگانه؛ ٢) آستین بلند.

**قۆچکە:** ١) کۆچکە، قۆچك؛ ٢) دەرپەڕیوەی سەری کڵاو ف ١) کلوتهٔ زنانه و بچگانه؛ ٢) برجستگی روی کلاه.

**قۆچکەتاش:** پێشەسەرتاشینی زارۆکان بۆ جوانی ف موی آهیانه ستردن برای زینت کودکان.

**قۆچکەسۆرانی:** ئەنگوچکەسۆرانی ف آستین بلند.

**قۆچلێدان:** شاخ‌تێ هەڵدان ف شاخ‌زدن.

**قۆچوەشاندن:** قۆچ لێدان ف شاخ زدن.

**قۆچوەشێن:** حەیوانێ کە بە شاخ لە خەڵك دەدا ف شاخ‌زن.

**قۆچهاوێژ:** قۆچ وەشێن ف شاخ‌زن.

**قۆچهاویشتن:** قۆچوەشاندن ف شاخ‌زدن.

**قوُچـەبڵبـاس:** گونـدێکـە لە کوردستـان بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**قوُچـەسپیلکـە:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**قۆچەقانی:** قاڵماسك، قاڵماسکە، بەرەقانی، کەهنیك ف فلاخن.

**قوُچەك:** قوُچی چکۆڵە ف مخروطی کوچك.

**قوُچەکە:** ئەنگوستیلەی دورمانان ف انگشتانه.

**قوُچەلاّن:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**قوُچەلەر:** گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**قۆچەمل:** گەردنی بڕاوی باڵدار لە چێشتا ف گردن بریدهٔ پرنده در غذا.

**قۆچەملە:** قۆچەمل ف نگا: قۆچەمل.

**قۆچی‌تاش:** قۆچکەتاش ف نگا: قۆچکەتاش.

**قۆچی‌قوربان:** ١) پەزێ کە لە جێژنی گەورەدا دەیکەنە خێر؛ ٢) برێتی لە فدایی ف ١) گوسفند قربانی؛ ٢) کنایه از جان فدا، فدایی.

**قۆخ:** ١) خۆخ، هەشتاڵو، هلو؛ ٢) خانوی چکۆڵەی راوکەران لە دەشت؛ ٣) خانوی پچوُکی بێ‌نرخی هەژاران؛ ٤) پشت‌چەماو، قۆپ؛ ٥) چەو؛ ٦) سەرتۆپە، تۆپەسەر: (سینی ساوار گۆشت لەسەر **قۆخی** بو) ف ١) هلو؛ ٢) کوخ شکارچی؛ ٣) خانهٔ محقّر؛ ٤) خمیده، کوژ؛ ٥) شن؛ ٦) بالاترین نقطه.

**قۆخا:** کاربەدەستی دێ لەپاش خاوەن مڵك ف کدخدای ده.

**قۆختـــە:** ١) قۆخی راوکـەر؛ ٢) ماڵی چکـۆڵـەی بێ‌نرخ ف ١) کوخ شکارچی؛ ٢) خانهٔ محقّر.

**قۆخدان:** چەمانەوە ف خمیده‌شدن.

**قۆخل:** قۆختە ف نگا: قۆختە.

**قۆخنادر:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**قۆخە:** قفە ف سرفه.

**قۆخەقۆخ:** ١) قفینی زۆر؛ ٢) رۆیشتن بە پشتی چەماو ف ١) سرفهٔ زیاد؛ ٢) راه‌رفتن با پشت خم.

**قوُخـەڵ:** مەلێکـە لە لەق‌لەق دەکاو گچکەترە. *لەدەم ئاوان دەگەڕێ* ف پرنده‌ای است.

**قودب:** قوتب ف مرشداعلی.

**قۆدك:** ئاوینەی گیرفان، قوتیلە ف آیینهٔ جیبی.

**قۆدی:** ١) قوتوُ؛ ٢) قۆدك ف ١) قوطی؛ ٢) آیینهٔ جیبی.

**قودیك:** قۆدی ف نگا: قۆدی.

**قودیلە:** چرافنیلە ف چراغ موشی.

**قوڕ:** حەڕی، خۆڵی تەڕ ف گِل.

**قۆر:** ١) داڵگوشت، لاواز، لەڕ، لەجەر؛ ٢) کۆزی هەڵپەڕکێ؛ ٣) پاشڵی ئاژەڵ؛ ٤) لوُلاکی پێ؛ ٥) نهۆم؛ ٦) تێ وروکان‌و بەوردی تماشاکردن ف ١) لاغـر؛ ٢) حلقـهٔ رقص؛ ٣) بخش انتهایی دام؛ ٤) استخوان ساق؛ ٥) اشکوبه؛ ٦) به دور چیزی جمع شدن و نگریستن.

**قۆڕ:** ١) گون‌داچـــوڕاوی پەنـــەمـاو؛ ٢) برێتی لە قسـەو کاری بێ‌تام؛ ٣) ئامرازی شەڕ: (**قۆڕخانە**)؛ ٤) دەنگی زگ، قڕە: (**قۆڕقۆڕی** زگە لە برسا)؛ ٥) هەراو دەنگ، دەگەڵ زەنگ دەگوترێ: (زەنگ‌و قۆڕ) ف ١) فتقی؛ ٢) کنایه از سخن یاوه و کار هرزه؛ ٣) جنگ‌افزار؛ ٤) صدای شکم؛ ٥) جنجال و هیاهو.

**قوُر:** بەرانبەری پەل، قوُل، کوُڕ ف ژرف.

**قوڕاب:** خۆپەسندی بەدفەڕ ف خودخواه گردن‌کلفت.

**قوڕابی:** جۆرێ شیرنی که له ئاردەبرنج دەکرێ، غوڕابی [ف] نوعی شیرینی.

**قۆڕات:** بنکی ئەستوورو خڕی گیا [ف] ریشهٔ کلفت گیاهی، پیازه.

**قوڕاچکه:** سورێچکه [ف] سرخنای، خرخره.

**قوڕاد:** بەربەسێل [ف] آش با گوشت و ماست.

**قوڕاده:** ۱) گیایەکه تیژ بنی وەك تەڕەپیازه، کوڕاده؛ ۲) ئاسنجاو، سەقەت [ف] ۱) ترهٔ کوهی؛ ۲) قراضه.

**قوڕافتن:** دەرامەدی مەزراکۆکردنەوە [ف] برداشت محصول عموماً.

**قوڕاله:** گیای قوڕاده، کوڕاده [ف] ترهٔ کوهی.

**قوڕان:** فڕکردن [ف] سرکشیدن نوشیدنی.

**قۆڕانـدن:** ۱)دەنگ‌دانی زگ؛ ۲)بۆڕاندنی ڕەشەولاخ [ف] ۱) قرقرکردن شکم؛ ۲) صداسردادن گاو.

**قوڕاندن:** گریانی سەگ له ئێش‌پێ‌گەیشتن [ف] گریهٔ سگ از آزاردیدن.

**قۆڕانن:** قوڕاندن [ف] نگا: قوڕاندن.

**قوڕانن:** قوڕاندن [ف] نگا: قوڕاندن.

**قورانه:** ڕێسەی درگا [ف] قسمت ضخیم دَر.

**قوڕاو:** ۱) زلیتاو، جلێتاو؛ ۲) بەربەسێل، قوڕاد؛ ۳) ئاوی لێڵ [ف] ۱) لجن؛ ۲) آش ماست و گوشت؛ ۳) آب گل‌آلود.

**قوڕاوی:** حەڕی پێوه نوساو [ف] گل‌آلود.

**قوڕاویلکه:** ئاورۆشن کەره، ئاوەڕۆنکه [ف] حشره ایست، دبیب.

**قوڕاویله:** باڵداریکه لنگ‌و دندوك‌درێژ بەقەی سوێسکه [ف] پرنده‌ای است.

**قوڕباج:** قامچی، شەلاخ [ف] تازیانه.

**قوڕباجه:** خروزەك [ف] سعال دیکی، خروسك.

**قورباق:** بۆق، قرباق، بەق [ف] قورباغه.

**قوربـان:** ۱) وشـەی ڕێزگرتن، ئەزبەنی؛ ۲) دەسەرگەڕان، بەلاگێڕ؛ ۳) گۆشـتـی خێرێ له جەژنـی گەورەدا؛ ۴)حـەیوانـی خێرێ؛ ۵) دوامین‌مانگی ساڵی موسـوڵمانان؛ ۶) جێژنی گەورەی ئیسلام [ف] ۱) کلمهٔ احترام؛ ۲) فدا؛ ۳) گوشت قربانی؛ ۴) حیوان قربانی؛ ۵) ماه ذی حجّه؛ ۶) عید قربان.

**قوربانی:** ۱) گۆشتی قوربان؛ ۲)حەیوانی قوربان؛ ۳) ناوه بۆ پیاوان [ف] ۱) گوشت قربانی؛ ۲)حیوان قربانی؛ ۳) اسم مردانه.

**قوڕبەست:** پێ‌خوێ له قوڕ [ف] تودهٔ کاهگل.

**قوڕبەسەر:** خاکەسەر، بێچاره [ف] بیچاره، خاك بر سر.

**قورپ:** کورك، مەلی کڕکەوتوو [ف] کرچ.

**قورپاچ:** قامچی، تازیانه، شەلاخ [ف] تازیانه.

**قوڕپەست:** قوڕبەست [ف] تودهٔ کاهگل.

**قوڕپێوان:** برێتی له قوڕوەسەرکردن له بەدبەختیان: (لەسەرخۆچوونه، شەیدابـوونـه، **قوڕپێوانه** سوتـانـه/هەتا مردن مەحەببەت ئیشی زۆره ریزی لێ دەگرم) «مەحوی» [ف] کنایه از خاك بر سر ریختن از بیچارگی.

**قوڕپێوەدان:** ۱) برێتی له بەدوامین دەرەجـەگەیشتن: (هێنـدی قارانج کرد **قوڕی پێوەدا**)؛ ۲) برێتی له بەیەکجاری وێران کردن [ف] ۱) کنایه از به منتها درجه رسیدن ۲) کنایه از یکباره نابود کردن.

**قورت:** ۱) قووت، لەگەروچوونەخوار؛ ۲) باڵداریکه؛ ۳) قوم، تەپاو له شتی تراوو ئاودا [ف] ۱) بلع، قورت؛ ۲) پرنده ایست؛ ۳) غوطه‌ور.

**قۆرت:** ۱) بەرگر، لەمپـەر؛ ۲) بەلاو چۆرتم؛ ۳) بەنـدو گرێ له درێژدا: (دارەکـه سێ قۆرتی تێدایه)؛ ۴) چاڵایی زەوی؛ ۵) بەرزایی کەم له ڕێگـەی راستـدا؛ ۶) کڕین‌و فرۆشتنی بێ پێوان‌و کێشان، گۆتره؛ ۷) ملی باڵدار [ف] ۱) گیروگرفت، مانع؛ ۲) بلاو آسیب؛ ۳) گره در چوب و نی و...؛ ۴) چالـه‌چـوله؛ ۵) بلندی در راه راست، دست‌انداز؛ ۶) خریدوفروش بدون توزین و حساب؛ ۷) گردن پرنده.

**قورتاڵ:** قوتار [ف] نگا: قوتار.

**قورتاندن:** قوت‌دان، قویت‌دان، لەگەرو ناردنەخوار [ف] بلعیدن.

**قۆرتانن:** لچ‌و لێو گرژکردن [ف] روی درهم کشیدن، اَخم کردن.

**قۆرتاوی:** ۱) درێژی بەگرێ؛ ۲) ڕێگەی پڕ بڵندی‌و نزمی؛ ۳) ڕێگەی پڕ له قوڵکەو کۆسپ [ف] ۱) بلندگره‌دار؛ ۲) راه پرفراز و نشیب؛ ۳) راه پرچاله‌چوله.

**قۆرتتێخستن:** لەمپەرو بەرگر خستنه بەرکارو بار، چەت تێ‌خستن [ف] چوب لای چرخ گذاشتن.

**قۆرتتێ کەوتن:** بەرگر هاتنـه پێش کاروبار، چەت تێ‌کەوتن [ف] مانع روی آوردن.

**قۆرتقۆرتاوی:** قۆرتاوی [ف] نگا: قۆرتاوی.

**قورتم:** ۱) سورێنچکـه؛ ۲) بێڤلی فیل؛ ۳) تورەکەی ملی کەڵك [ف] ۱) سرخنای؛ ۲) خرطوم؛ ۳) کیسهٔ گردن پلیکان.

**قۆرتم:** ۱) بەسـەرهاتی ناخۆش، چۆرتم؛ ۲) قورتمی فیل؛ ۳) قورتمی کەڵك [ف] ۱) پیشامد ناگوار؛ ۲) خرطوم؛ ۳) کیسهٔ گردن پلیکان.

**قورتن:** داریکی لێرەواره [ف] درختی است جنگلی.

**قۆرته:** قۆتره [ف] هروله.

**قۆرتەلاس:** گوندێکه له کوردستان بەعسی وێرانی کرد [ف] از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**قوڕتێدان:** حەڕی پێداساوین [ف] گِل‌مالی.

**قورتیك:** قووت‌دان [ف] بلعیدن.

**قۆرج:** ۱) تێخوڵی شینی گوێز؛ ۲) کلۆربوونی دران، کرموڵ‌بوون دیان [ف] ۱) پوستهٔ سبز گردو؛ ۲) کرم خوردگی دندان.

**قورچ:** ۱) سووچ، قوژبن، گۆشه؛ ۲) فڕ [ف] ۱) گوشه؛ ۲) جرعه.

**قورچاندن:** ۱) قووت‌دانی پارو؛ ۲) فڕکردن [ف] ۱) بلعیدن؛ ۲) جرعه‌نوشیدن.

**قورچی:** نقورچك، قورینج، بەنینۆك ئازاردانی پێست [ف] نیشگون.

**قورچیا:** لەو گوندانەی کوردستانه که بەعسی کاولیان کرد [ف] روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**قورچی کرن:** نقورچك گرتن، قورینجاندن [ف] نیشگون گرفتن.

**قورحان:** قروئێ، پەراوی هەرەپیرۆزی ئیسلام [ف] قرآن.

**قورحه:** ۱) پسوڵەی خۆت‌وبەختت؛ ۲) برینی ڕۆخڵه [ف] ۱) قرعه؛ ۲)

بازو.

**قەڵـەمـی:** ١) بریتـی لە باریك و جوان و ڕێك؛ ٢) بریتـی لە قسـەی خوێندەوارانە کە هەموکەس تێ نەگا ف ١) قلمی، باریك؛ ٢) کنایه از سخن مغلق و دیرفهم، لفظ قلم.

**قەڵـەمی ئاسن:** ئاسنێکی کورتی سەرتیژە دارکـار و سنعاتگەر دەکاری دەکەن ف قطعه‌آهنی که از ابزار صنعتگران است.

**قەڵەن:** قالان، شیر بایی ف شیر بها.

**قەڵەند:** قەڵەن، شیر بایی ف شیر بها.

**قەڵەندۆر:** دۆریە، گندۆر، گیایەکە ف گیاهی است.

**قەڵـەندەر:** ١) فەقیر، بەڵەنگاز؛ ٢) عەبداڵ، دەروێش؛ ٣) بەستەزمان و بێ زیان ف ١) بی چیز؛ ٢) خانه‌بدوش؛ ٣) بیچاره و خجالتی.

**قەڵەندەراوا:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**قەڵەنگ:** قەڵادەی تاژی ف قلاده سگ شکاری.

**قەڵەنگوێ:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**قەڵـەو:** ١) گۆشتـن، پڕگۆشـت؛ ٢) چێشـتـی چەور؛ ٣) بریتـی لە دەوڵەمەندی زل ف ١) چاق؛ ٢) غذای چرب؛ ٣) کنایه از ثروتمند کلان.

**قەڵەوایی:** چەورایی چێشت ف چربی غذا.

**قەڵـەوبوُن:** ١) گۆشت گرتن؛ ٢) بریتی لە دەوڵەمەندبوُن ف ١) چاق شدن؛ ٢) کنایه از ثروتمند شدن.

**قەڵەوەز:** قەڵبەزە ف موج رودخانه.

**قەڵەوی:** تێرگۆشتی ف چاقی.

**قەڵـەهـەربـەت:** گونـدێکی کوردستـانـە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**قەلهین:** لەبەین چوُن، شوێنەوار نەمان ف ازبین رفتن.

**قەلی:** ١) قاورمـە؛ ٢) گۆشتی سوُرەوەکـراو ف ١) قورمه؛ ٢) گوشت سرخ شده.

**قەلی پیڤـاز:** گۆشتی سوُرەوەکـراو بەپیاز و تەمـاتـەوە ف گوشت با گوجه‌فرنگی و پیاز سرخ شده.

**قەلیز:** چڵکن، پیس، پەڵۆخ ف چرکین، کثیف.

**قەلیسیل:** بەربەسێل، قوڕاو ف غذای ماست و گوشت.

**قەلین:** ١) جۆشین لەسەر ئاگر؛ ٢) سەبیلە، قەلوُن؛ ٣) توانەوە، حەلین ف ١) جوشیدن بر آتش؛ ٢) چپق؛ ٣) گداختن.

**قەلینۆك:** برێشکە، دانەوێڵەی بۆدراو لەسەر ساج ف دانه‌های غلّهٔ بوداده.

**قەلینەك:** تاوە ف تابه.

**قەلیە:** ١) قەلی؛ ٢) چێشتێکە ف ١) نگا: قەلی؛ ٢) غذایی است.

**قەم:** ١) قەمتەرە، ئاوبارە؛ ٢) قانگ، توُری پوُك؛ ٣) داری وشك ف ١) قنطره؛ ٢) ترب پوك؛ ٣) چوب خشك.

**قەمار:** قومار ف نگا: قومار.

**قەمارە:** ١) ترومبێلی سواری؛ ٢) ژوُری چەندکەسی لە شەمەندەفەردا ف ١) ماشین سواری؛ ٢) کوپهٔ قطار.

**قەمامە:** ١) قومامە؛ ٢) گیایەکە وەك گەنم دەچێ ف ١) نگا: قومامه؛ ٢) گیاهی است.

**قەمان:** وشك بوُنی داری تەڕ ف خشکیدن هیزم تر.

**قەماندن:** ١) وشك کردنەوەی داری تەڕ؛ ٢) جلك تێ وەشاندن؛ ٣) نان بەئاگر ڕاداشتن؛ ٤) پاراستن ف ١) خشکانیدن هیزم‌تر؛ ٢) لباس بر تنور تکاندن؛ ٣) نان بر آتش گذاشتن؛ ٤) حمایت کردن.

**قەمبوُر:** پشت‌چەماو ف کوژ، پشت خمیده.

**قەمبەر:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**قەمبەرە:** قونبولە ف بمب، گلوله توپ.

**قەمت:** ١) پێسیر؛ ٢) شەنگلەبـەرەکـەتـە ف ١) گریبان، یقه؛ ٢) میوهٔ دوقلوی بهم چسبیده.

**قەمتار:** جانەوەرێکە بۆر لە گورگ زلتر و گۆشت‌خۆرە، کەمتیار ف کفتار.

**قەمتاڵ:** ڕەگ و بنی گەڵاڕێواس، ڕەگی کلاوبن ف ریشهٔ نوعی ریواس.

**قەمتاندن:** بابوڵەپێچ کردنی منداڵی ساوا ف قنداق پیچ کردن بچّه.

**قەمتك:** ١) دەسرۆکەی سەری ژنان؛ ٢) پشتمل ف ١) لچك؛ ٢) پس گردن.

**قەمتەر:** ١) دەمبێنی حەیوان؛ ٢) خەزێمی بێڤلی ورچ و وشتر کە بەنی تێ دەخـرێ؛ ٣) بریتی لەمـرۆی ڕژدوچکـوُس ف ١) پوزه‌بند؛ ٢) مهار، خطام شتر و...؛ ٣) کنایه از خسیس.

**قەمتەرکراو:** ١) دەم‌بەستراو؛ ٢) بریتی لە ڕژد، ڕەزیل، چکوُس ف ١) پوزه‌بسته؛ ٢) کنایه از خسیس.

**قەمتەرکردن:** ١) دەم‌بەستن بە زنجیر؛ ٢) بریتی لە بێدەنگ کردن ف ١) پوزه‌بستن؛ ٢) کنایه از ساکت کردن.

**قەمتـەرە:** ١) ئاوبارە؛ ٢) گوندێکە لە کوردستان ف ١) قنطره؛ ٢) نام دهی است.

**قەمتەری:** قەمتەرکراو ف نگا: قەمتەرکراو.

**قەمتی:** ١) گرێدراو، پەیوەندی؛ ٢) ئەوەندە گیایەك لەدەستاجێ دەبێتەوە ف ١) وابسته؛ ٢) پر یك دست گیاه دسته شده.

**قەمچ:** ١) نزیکی، تخوُن، قەرە؛ ٢) پڕی دەستێك، لاوێچ؛ ٣) باو، پێچ؛ ٤) چەوی لوُسی دەم چەم؛ ٥) موُ بەقـەیچی‌پاچین؛ ٦) دوڕە، تاژی دوُڕەگە؛ ٧) پەرتاوتنی دار؛ ٨) بریتی لە کلکی حەیوان ف ١) نزدیکی، دردستـــرس؛ ٢) پریك کف دست؛ ٣) پیچ، تاب؛ ٤) شن صاف و ساییده؛ ٥) موی با قیچی چیده؛ ٦) سگ دورگه؛ ٧) هرس درخت؛ ٨) کنایه از دم حیوان.

**قەمچان:** بازەڵێن ف نوعی بازی با شن، یەقل‌دوقل.

**قەمچاندن:** پێچان، باوپێدان ف پیچانیدن.

**قەمچك:** ١) دوی بزن؛ ٢) قونچکی میوە؛ ٣) پشتمل ف ١) دم بز؛ ٢) دنبالچهٔ میوه؛ ٣) پس‌گردن.

**قەمـچ کردن:** نیشـان کردنی بزن و مەڕ بە هەڵپاچینی هێندێ کوڵکە ف

علامت‌گذاری دام با قیچی برکردن پشم و موی.

**قەمچوغە:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد [ف] روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**قەمچوك:** قاپوچکەماست [ف] نگا: قاپوچکە.

**قەمچی:** ١) قامچی، شەلاخ؛ ٢) جۆرێ خشڵی ژنانە [ف] ١) تازیانە؛ ٢) نوعی زیورآلات.

**قەمەرەددین:** زەردالـوی پانـەوەکراوی وشك کراو کە وەك نان دەچێ، نانەقەیسی [ف] لواشك.

**قەمرین:** بەستنی ئاو، بوُنەسەهۆڵ، بەستەلەك [ف] یخ بستن.

**قەمزە:** ١) ناز، عیشوە، عاشیرەت‌وەچەم؛ ٢) بەرگ، بەرگی نوشتە [ف] ١) غمزەوناز؛ ٢) پوشە.

**قەمزەنوشتە:** بەرگەنوشتە [ف] پوشش دعای نوشتە.

**قەمس:** نارّاستی، فێڵ و گزی [ف] حیله و نیرنگ.

**قەمسەڵە:** چاکەتی گەرمی زستانە کە لەسەرەوە دەپۆشرێ [ف] کاپشن.

**قەمسی:** نارّاست، دەغەڵ [ف] دغل‌باز.

**قەمك:** دزی زەبر بەدەست و خێرا [ف] طرّار، دزد ماهر.

**قەمکە:** قەمك [ف] طرّار.

**قەملاخ:** راوەکەو بەبێ‌چەك [ف] گرفتن کبك در برف.

**قەموُر:** قەمبوُر [ف] کوژپشت.

**قەموُش:** سارێژ، توێخی باش پەڕینە سەر زام [ف] التیام.

**قەموُشك گرتن:** ١) سارێژ بوُن؛ ٢) کەشاو هاتنەوەی زەوی، بەگابوُن [ف] ١) التیام یافتن؛ ٢) نیم خشك شدن زمین آبیاری شدە.

**قەمە:** قەدارە [ف] قمە، غدارە.

**قەمـەر:** ١) ئەسپی سوُری ئاماڵ‌ڕەش، کوێتی داوێن‌تاریك؛ ٢) مرۆی گەنم‌ڕەنگ، ئەسمەر؛ ٣) گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد [ف] ١) کمیت؛ ٢) گندم‌گون؛ ٣) روستایی در کردستان کە توسط بعثیان ویران شد.

**قەمەردین:** نانەقەیسی، زەردالوی پانەوەکراو [ف] لواشك.

**قەمەرە:** قەمارە [ف] نگا: قەمارە.

**قەمەری:** پارەی ورد، قۆشە، فلس، شایی، فەتالی [ف] پشیز.

**قەمەریلی:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد [ف] نام روستایی در کردستان کە توسط بعثیان ویران شد.

**قەمـەزەن:** ١) چەقـۆکێش، شەلاتی؛ ٢) کەسێ لە عاشـورادا بە قەمە خۆی بریندار دەکا [ف] ١) چاقوکش؛ ٢) قمەزن.

**قەمی:** رەنگە، وێدەچێ، ئەشێ، دەبێ [ف] شاید، گمان میرود.

**قەمیش:** ١) قامیش، چیت، چیتك؛ ٢) پەڕەسیغارێ کە ئاغزی تێدایەو توتنی تێ دەکەن [ف] ١) نی؛ ٢) نوعی کاغذ سیگار فیلتردار.

**قەن:** شەکری پێکەوەچەسپاوی درشت [ف] قند.

**قەنا:** بەلانی کەم، هیچ‌نەبێ [ف] حدّاقل، اقلاً.

**قەنـاراوە:** گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد [ف] از روستاهای ویران‌شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**قەنـارە:** چنگـاڵـەئـاسنی گۆشت پێدالـەقـاندنی قەسابان؛ ٢) داری پێ‌خنکاندنی تاوانبار، سێدارە [ف] ١) چنگك دکان قصّابی؛ ٢) دار اعدام.

**قەنـاری:** چوێلەکـوڵەیەکی زەردی دەنگ‌خۆشە لە زەردەزیڕە دەکا [ف] پرندهٔ قناری.

**قەنـاس:** ١) زمینی خێچ‌وخـواری لایەك تەسك و لایەك پان؛ ٢) دەورو بەری ماڵ [ف] ١) زمین کج؛ ٢) برف‌انداز خانە.

**قەناوێز:** خامەك، پارچەیەکی ئاوریشمی بەڕەنگی بنەوش یان ئەرخەوانی [ف] قناویز، پارچەای ابریشمی.

**قەنبەل:** لای چەپ [ف] طرف خب، یسار.

**قەنتار:** قەتاری چارەوێ [ف] قطار ستور.

**قەنتەر:** قەمتەر [ف] نگا: قەمتەر.

**قەنتەرە:** ئاوبارە، قەمتەرە [ف] پُل آبرسان.

**قەنج:** ١) باش، خاس، پەسند؛ ٢) جوان، خوشیك [ف] ١) خوب؛ ٢) زیبا.

**قەنجانی:** پیاوەتی، جوان‌مێری، چاکە، مێرانی [ف] مردانگی، مردمی.

**قەنج کرن:** کاری چاك‌کردن، باش کردن [ف] کار نیکو کردن.

**قەنجەیسك:** گیایەکە بنەکەی دەخۆن. چەورەو *تامی گوێزهێندی دەدا* [ف] گیاهی است.

**قەنجی:** ١) چاکە، خاسی؛ ٢) جوانی، دەلالی [ف] ١) خوبی؛ ٢) زیبایی.

**قەند:** قەن [ف] قند.

**قەنداخ:** ئاوی کوڵاوی شەکرتێکراو [ف] شکراب جوشیدە.

**قەنداغ:** قەنداخ [ف] شکراب جوشیدە.

**قەندان:** جێگەی قەند [ف] قندان.

**قەنداو:** ١) ئاوی شیرن‌کراو بە شەکر؛ ٢) قەنداخ [ف] ١) شکراب؛ ٢) نگا: قەنداخ.

**قەندرخە:** گیایەکە لە گەنم دەچێ [ف] گیاهی است شبیه گندم.

**قەندرغە:** قەندرخە [ف] نگا: قەندرخە.

**قەندشکێن:** چاکوُچی قەندپێوردکردن [ف] قندشکن.

**قەندن:** کۆڵین، کەنن: (هەڵی **قەند** [ف] کندن.

**قەندو:** قەندان [ف] قندان.

**قەنـدول:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد [ف] نام روستایی در کردستان کە توسط بعثیان ویران شد.

**قەندە:** ١) باس‌قەنە، سەبیلەی کللك‌درێژ؛ ٢) نێرگەلە، قلیان‌ئاوی [ف] ١) چپق دستەبلند؛ ٢) قلیان.

**قەنـدەدار:** نۆکـەرێ کە لە دیوانـی گەورەپـیاودا کاری قلیان و سەبیلەتێکردنە [ف] نوکری کە کارش قلیان و چپق آمادە کردن است.

**قەندەڕێژ:** توتنی ئامادەکراو بۆ سەبیلە [ف] توتون آمادە شدە برای چپق.

**قەندەکێش:** ئالوُدە بە توتن‌کێشان [ف] دودی، معتاد بە توتون کشیدن.

**قەندەهاری:** جۆرێ تۆمی گەنم [ف] نوعی گندم.

**قەندی:** غەڵدی، تولەی‌ڕاو [ف] تولەسگ شکاری.

**قەندیل:** ١) چرای بەبنەبانەوە دالەقاو؛ ٢) ناوی چیایەکی زۆر بەناوبانگە

لە کوردستان ف ١) لوستر؛ ٢) نام کوهی معروف در کردستان.

**قەنـدیلە:** ١) فتیلەچـرا، قوتیلکەچرا؛ ٢) قوتکەی سەری کڵاو ف ١) چراغ موشی؛ ٢) نوك تیز کلاه.

**قەنگاس:** قەناس ف قەناس.

**قەنگە:** قەندە ف نگا: قەندە.

**قەنگەدار:** قەندەدار ف نگا: قەندەدار.

**قەنگەرێژ:** قەندەرێژ ف نگا: قەندەرێژ.

**قەنگەکێش:** قەندەکێش ف نگا: قەندەکێش.

**قەنگەلاشك:** قانگەلاشك ف نگا: قانگەلاشك.

**قەنگەڵاشك:** قانگەلاشك ف نگا: قانگەلاشك.

**قەنگەهاری:** قەندەهاری ف نگا: قەندەهاری.

**قەنە:** قەندە، قەنگە ف نگا: قەندە، قەنگە.

**قەنەدار:** قەندەدار ف نگا: قەندەدار.

**قەنەرێژ:** قەندەرێژ ف نگا: قەندەرێژ.

**قەنەکێش:** قەندەکێش ف نگا: قەندەکێش.

**قەنوس:** رەشی زۆرڕەش ف سیاه غلیظ.

**قەنوسی:** بەرەنگی زۆر ڕەش ف بەرنگ «قەنوس».

**قەنە:** وشەی *پرسیارە* . نەوایە؟ مەکێن وانیە؟ ف مگرنه؟

**قەنەپە:** قورسی درێژۆکەی سێ چوارنەفەرە، نیوەتەختی لەسەرنوستن ف نیمکت، کاناپە.

**قەنەفل:** گەڵاخونچەی وشکەوەکراوی گوڵی دارێکە زۆر بۆنخۆشەو بۆ دەرمان دەشێ، مێخەك ف میخك.

**قەنەفلێ:** سەر تەنگەی پاڵان ف ریسمان بالای تنگ پالان.

**قەنەفە:** قەنەپە ف نیمکت.

**قەنەك:** غەرغەرە، هەرشتێ کە ڕێسی لەسەر هەڵدە کرێ ف قرقره.

**قەنەواچە:** ناوئاخنی جلك ف آگنهٔ لباس، لایهٔ لباس.

**قەنەوز:** قەناوێز، خامەك ف قناویز.

**قەنی:** ١) بەچکەبـزنێ کە دێر لە دایك بو بێت؛ ٢) ئاژەڵی پوتـەکـەی داڵگۆشت ف ١) بزغالهٔ دیر زا؛ ٢) بز و گوسفند لاغر و کوچك.

**قەنیلە:** چرافتیلە، قوتیلکەچرا ف چراغ موشی.

**قەو:** ١) دەنگی بەرز، قاو: (بە قەو بانگی کە)؛ ٢) قەد ف ١) صدای بلند و قوی؛ ٢) نگا: قەد.

**قەوات:** نەریت، ئاکار، خوێ، خوو ف خوی و اخلاق.

**قەواخ:** ١) تێکـولێ بەتـاڵی هێلکـەو کولـەکـە؛ ٢) قاپوڕ ف ١) پوستهٔ توخالی؛ ٢) پوکه.

**قەواد:** دەویت ف جاکش.

**قەوار:** ١) ناوەڕۆکی تێخـوڵ، کاکـڵ؛ ٢) قوار، خۆڵـەکـەوەی پزیسکی تەندور ف ١) مغز میوه؛ ٢) خاکستر تنور.

**قەوارتن:** بەکوڵین ناوەڕۆك دەرهێنان ف با تیغ محتوای چیزی را بیرون آوردن.

**قەواروك:** کاکڵی فەریکەگوێز ف مغز گردوی دلمل.

**قەواروك:** سێلك، قەوان ف صفحهٔ گرامافون.

**قەوارە:** قەبارە، بارست ف حجم.

**قەوارین:** قەوارتن ف با تیغ محتوای چیزی را بیرون آوردن.

**قەواش:** کانـزایەکـی کونکونی کلکدارە بۆ کەفگرتـنـی چێشت بەکاردێ، کەوگیر ف کفگیر.

**قەواغ:** قەواخ ف نگا: قەواخ.

**قەواق:** مروی کاسەوگۆزەکەر، هەوڕگەر، ئیر بارکەر ف سفالگر.

**قەوال:** ١) پیاوی ئاینـی یەزیدی لە پایەی هەرەبـەرەژێردا؛ ٢) دەنگخۆش؛ ٣) جۆرێ تفەنگی قەدیمی؛ ٤) شەبابە، جۆرێ بلوێر ف ١) روحانی یزیدی دون پایه؛ ٢) خوش آواز؛ ٣) نوعی تفنگ قدیمی؛ ٤) نوعی نی نواختنی.

**قەواڵە:** قەباڵە ف قباله.

**قەوان:** ١) قاپـوڕەفیشـەك، قاوغ؛ ٢) سندوقی گۆرانی، گڕامافون؛ ٣) سەفحەی گرامافون؛ ٤) جۆرێ گوڵەبابونە کە چاوەگای پێ ئێژن ف ١) پوکه؛ ٢) گرامافون؛ ٣) صفحهٔ گرامافون؛ ٤) بابونهٔ گاوچشمی.

**قەوانچە:** فڕێدراو، بۆ دوور ئاوێژراو ف پرت شده.

**قەوانچەدان:** فڕێدان ف پرت کردن.

**قەوتە:** ئاپوڕە، حەشامات، کۆمەڵی زۆر لە مەردم ف تودهٔ مردم.

**قەوچ:** ١) دمخوار؛ ٢) گێلۆکە، کەمفام، ناتێگەیشتو ف ١) دهن کج؛ ٢) ابله.

**قەوچل:** ١) بێکارە، هیچ لێنەهاتو؛ ٢) لەکارنەزان؛ ٣) شپرێو؛ شپرزە؛ ٤) چڵمو ناوی لوتی منـداڵ ف ١) بیکـاره؛ ٢) ناشی؛ ٣) نامرتب؛ ٤) آب بینی بچه.

**قەوچـە:** ١) شەویلاکـەجـوڵاندن بە دەمی ئاوەڵەوە؛ ٢) سەرلێ شێواو، سەرگەردان ف ١) جنبانیدن فك با دهن باز؛ ٢) سرگردان.

**قەوچەبون:** سەرگەردان بون، دامان ف سرگردان شدن.

**قەوچـەقــەوچ:** برێتی لە قسـەکـردنی زۆرو بێمانـا: (وەسـا بەسیە قەوچەقەوچ!) ف کنایه از ژاژخاییدن.

**قەوچـەکردن:** ١) دەمجوڵاندنی ماکەر لە کاتی گاندانەدا؛ ٢) برێتی لە قسەی بێتام گوتن؛ ٣) برێتی لە سەرگەردان کردن ف ١) دهن جنبانیدن مادهالاغ در حال جماع؛ ٢) کنایه از یاوه گویی؛ ٣) کنایه از سرگردان کردن.

**قەور:** ١) قەبر، گۆڕ، گڵکۆ؛ ٢) دەرکراوی، وەدەرنراوی ف ١) قبر؛ ٢) دك.

**قەوران:** ١) سەرقەبران، قەبرستان؛ ٢) دەرکران ف ١) گورستان؛ ٢) راندهشدن.

**قەوراندن:** دەرکردن، قاودان ف راندن، دك کردن.

**قەورپشکنەك:** چالە، چالەکە، قوڕەبەشە، چوالو ف حیوان گورکن.

**قەورخە:** قەبرخە، خاڵیگە ف تهیگاه.

**قەورسان:** قەوران، گۆڕستان، قەبرستان ف گورستان.

**قەورکەن:** کەسێ کە قەبر بۆ مردگ دەکوڵێ ف آدم گورکن.

**قەورکەنە:** چالەکە، چوالو ف حیوان گورکن.

**قەورە:** بڕبەند ف سوهان.

**قەوز:** پسوڵەی حەساو، رەسید، قەبز ف رسید، قبض.

**قەوزە:** ۱) قۆزە، جلەشینەی سەر ئاو؛ ۲) قرێژەبەرد ف ۱) خزه؛ ۲) گل سنگ.

**قەوس:** ئاخرمانگی پایز ف آذرما.

**قەوساو:** ئاودانی باغ لە ئاخر پایزدا بۆ پەتای باغ قڕکردن ف آبیاری باغ در آذرماه برای دفع آفات.

**قەوساوە:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**قەوسەل:** مەتوڵۆکە ف چیستان.

**قەوسەلە:** ۱) قسەی بەزیپك؛ ۲) قسەی بەهیما ف ۱) سخن متلك‌آمیز؛ ۲) سخن رمز و اشاره.

**قەوش:** کلۆشی سەر خۆیان ف ساقه‌های جمع‌آوری شدهٔ سَر خَرمَن.

**قەوغا:** ۱) زۆر ئاوەدان؛ ۲) خێزانی زۆر لەماڵدا ف ۱) آباد؛ ۲) خانوادهٔ پرجمعیّت.

**قەول:** بەڵێن، پەیمان، شەرت، مەرج ف پیمان، عهد.

**قەوڵ:** ۱) قەول؛ ۲) قەبڵ ف ۱) نگا: قەول؛ ۲) نگا: قەبڵ.

**قەوڵان:** قەبڵان ف نگا: قەبڵان.

**قەوڵانن:** قەبڵاندن ف ارزیابی کردن.

**قەوڵك:** تۆرەکەی پچوکی وردەشت ف توبرهٔ خرت و پرت.

**قەولوبڕ:** قەرارداد، شەرت‌و پەیمان ف توافق بر کاری.

**قەولوبڕی:** قەولو بڕ ف توافق.

**قەولەق:** ۱) سورمەدان، کلتوڕ؛ ۲) تۆرەکەی چکۆلە ف ۱) سرمه‌دان؛ ۲) توبرهٔ کوچك.

**قەولەك:** قەولەق ف نگا: قەولەق.

**قەوم:** قۆم ف نگا: قۆم.

**قەوما:** ڕوی دا، پێش‌هات ف اتّفاق افتاد، پیش‌آمد.

**قەومار:** بەسەرهات‌و ڕوداوی ناخۆش‌و دڵ‌تەزێن ف حادثهٔ دلخراش.

**قەومان:** ۱) خزمان؛ ۲) ڕوداو، بەسەرهات، قۆمان؛ ۳) پیروزورهان، پیری لەکارکەوتە ف ۱) خویشان؛ ۲) پیشامد؛ ۳) پیر ازکار افتاده.

**قەوماندن:** ئاژاوەو پشێوی نانەوە ف حادثه‌آفریدن.

**قەوماو:** ڕوداوی ناخۆش ف رویداد ناگوار.

**قەومك:** کەدوسەراوی، کوڵەکەسەراوی ف نوعی کدو.

**قەومی:** ۱)قەوما؛ ۲) رەچەڵەکی، گەلی ف ۱) نگا: قەوما؛ ۲) ملّی.

**قەومیان:** قۆمیان، قەومان ف اتّفاق ناگوار افتادن.

**قەومین:** قۆمیان ف اتّفاق ناگوار افتادن.

**قەووڕك:** کاکڵەگوێزو بادامی فەریك ف مغز بادام و گردوی هنوز نرسیده.

**قەوە:** تابشت، توانا، تاقەت ف نیرو.

**قەوەت:** ۱) قەوە؛ ۲) وشەیەکە وەك ئۆخەی: (قەوەت دە وەرە لام) ف ۱) نیرو؛ ۲) کلمه‌ای است نشانهٔ دوستی، جانم.

**قەوی:** ۱) ئەستوور: (مل قەوی)؛ ۲) بە تاقەت؛ ۳) دەسەڵات‌دار؛ ۴) ساغ ودوست؛ ۵) خورت، بەهێز؛ ۶) فریە، فرە، گەلەك ف ۱) ستبر؛ ۲) باتحمل؛ ۳) بانفوذ؛ ۴) صحیح و سالم؛ ۵) نیرومند؛ ۶) فراوان.

**قەویت:** ۱) سەرپەرشتی خێزانی مردگ؛ ۲) راسپێر ف ۱) قَیّم؛ ۲) سفارش کننده.

**قەویتی:** ۱) کاری قەویت؛ ۲) راسپێری ف ۱) قیّمی؛ ۲) سفارش.

**قەویل:** قبوڵ: (قەویلتە قەویلت نیە وەهیچ) ف قبول.

**قەویلە:** ۱) خڕی قوڵەی قەڵەو؛ ۲) قەبیلە، بەرەباب؛ ۳) گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف ۱) کوتاه‌قدچاق؛ ۲) قبیله؛ ۳) نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**قەوین:** قەوی ف نگا: قەوی.

**قەوینتی:** راسپێری ف سفارش.

**قەهبك:** جندە، قەحبك، قاحبە ف فاحشه.

**قەی:** ۱) قەد؛ ۲) بۆچی؛ ۳) کەوایە، کەوابو؛ ۴) وشەیەکە بەواتا: مانع: (قەی ناکا، **قەی** چیە؟)؛ ۵) ئەدی؛ ۶) ڕشانەوە: (شیرەکەی **قەی** کردگەسەو) ف ۱) نگا: قەد؛ ۲) چرا؛ ۳) پس، که اینطور؛ ۴) مانع، اشکال؛ ۵) آری؛ ۶) قی.

**قەیا:** ناوە بۆ پیاوان ف نام مردانه.

**قەیاخ:** ۱) گیایەکە؛ ۲) بەلەمی پان‌و زل بۆ بارو پەڕینەوە ف ۱) گیاهی است؛ ۲) قایق باربری.

**قەیاخەوان:** قەیاخ‌ئاژۆ ف قایقران.

**قەیار:** ۱) نینۆکی درێژی یەکسم کە ئەیتاشن؛ ۲) پنجەگیا؛ ۳) سوکەناوی قادر؛ ۴) قەراغ، کەنار؛ ۵) پنجی درزی دیزەو گۆزە ف ۱) ناخن تراشیدنی ستور؛ ۲) بوتە گیاه؛ ۳) مخفّف نام قادر؛ ۴) کنار، گوشه؛ ۵) چسب درز ظرف سفالین.

**قەیارە:** قەدارە ف غداره.

**قەیاسە:** باربەندی پان لە چەرم ف باربند پهن چرمی.

**قەیاسەدین:** ناوی ئاواییەکە ف نام روستایی است.

**قەیاغ:** ۱) بەلەمی بارپەڕاندنەوە، قەیاخ؛ ۲) گیایەکی بالابەرزی تەفقەفە ف ۱) قایق باربری؛ ۲) گیاهی است.

**قەیبڕ:** قەدبڕ ف راه میانبر.

**قەیتان:** شریت ف رشتهٔ بافتهٔ باریك.

**قەیتوڵ:** ناوی ناوچەیەکە لە کوردستان ف ناحیه‌ای در کردستان.

**قەیتوڵی:** ۱) ناوە بۆ پیاوان؛ ۲) گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف ۱) نام مردانه؛ ۲) نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**قەیتەران:** ۱) گیایەکی لاسك‌ڕەشە؛ ۲) ناوی پاڵەوانێکی چیرۆکە: (قارەمان‌و قەیتەران) ف ۱) گیاهی است؛ ۲) نام گردی باستانی.

**قەیچی:** تۆرتۆ، مەقەس ف قیچی.

**قەیچی‌بڕ:** بەتۆرتۆبڕین ف قیچی‌بر.

**قەیچی کردن:** بەرتاوتن بە قەیچی: (لە کوڵمت هەرچی خارج بێ سەری ئەگریجە **قەیچی** کە/بڵێن با سەربڕینی خارجی بۆ ڕەونەقی دین بو) «سالم» ف با قیچی بریدن.

**قەی‌چیە:** چەعەیبی هەیە؟، مانع چیە؟ ف چه مانعی دارد؟.

**قەید:** ۱) قەی، عەیب و مانع؛ ۲) ئاڵقەی ئاسن؛ ۳) ئاڵقەگوریسی تابار بە تابارەوەدان؛ ۴) جومگەی یەکسم؛ ۵) هەوای گۆرانی ف ۱) مانع؛ ۲) حلقهٔ آهنی؛ ۳) ریسمان حلقه‌شده را به لنگه‌بار چسبانیدن؛ ۴) مچ ستور؛ ۵) آهنگِ ترانه.

**قەیدك:** ۱)جومگەی یەکسم، قەید؛ ۲) زنجیری پەل‌بەندی یەکسم؛ ۳) پەراوێز لە دەورو ژێر پەراو نوسین ف ۱) مچ ستـــور؛ ۲) زنجیر پای ستور؛ ۳) حاشیهٔ نوشتار.

**قەیدێ:** ماوەیەك لەزەمـان: (قـەیدێ باوابێ بەڵام ڕۆژی ئەبێ منـداڵی کورد) «حەمدی» ف مُدّتی.

**قەیر:** ئەندازە، قەدەر ف اندازه.

**قەیران:** ۱) بەڵێن بۆ کاتدیاری کردن: (**قەیران**مان سەری مانگ بێ)؛ ۲) جەنگـــەی تونـــدو تیژی نەخـــۆشی: (ئـەم نەخـۆشیە چواررۆژ قەیرانیەتی)؛ ۳) لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف ۱) میعـادزمـانی؛ ۲) بحـران بیماری؛ ۳) روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**قەیرە:** ۱)بـەتـەمەن‌تر لە جەنگەی جوانی‌و لاوەتی: (**قەیرەکچە، قەیرە پیاوە**)؛ ۲) لەکاردەرهاتگ: (ئەسپەکە **قەیرەیە**)؛ ۳) بەرانی پەنج‌ساڵە ف ۱) مسن‌تر از عنفوان جوانی؛ ۲) کارکشته؛ ۳) قوچ پنج ساله.

**قەیسـك:** ۱) عاسا، داروەکاز؛ ۲) مشتوی خەنجەرو دەسکی شیر؛ ۳) باگردێن، بانگلێر ف ۱) عصا؛ ۲) دستهٔ شمشیر و خنجر؛ ۳) بام غلتانك.

**قەیسەر:** ۱) تەزی، قوفل، قەفل، سڕی؛ ۲) پاڵشای زەلام ف ۱) کرخ از سرما؛ ۲) پادشاه.

**قەیسەربوُن:** لەسەرمان سڕبوُن ف کرخیدن از سرما.

**قەیسەرقو:** چاوەنوازی زیاد ف انتظار زیاد.

**قەیسەری:** راستەبازاڕ، گوزەر ف راسته‌بازار.

**قەیسی:** ۱) زەردالۆ؛ ۲) دەنکەخۆشەی زەردالۆ ف ۱) زردالو؛ ۲) هستهٔ شیرین زردالو.

**قەیسیل:** قەرسیل ف نگا: قەرسیل.

**قەیش:** قایش ف چرم ورنی.

**قەیفە:** قەدیفە ف نگا: قەدیفە.

**قەیفەیی:** رەنگی ئاڵ ف قرمز روشن.

**قەیقەناخ:** هێلکەوڕۆنی بەدۆشاو، خاوڕۆنی بەشۆك ف خاگینه با شیرهٔ انگور.

**قەیك:** بەلەم، قەیاغ ف قایق.

**قەیل:** ۱) بڵند، بەرز؛ ۲) سەرعێل ف ۱) بلند؛ ۲) سردار ایل.

**قەیلۆك:** داوەڵ، داهۆڵ ف مترسك.

**قەیلە:** گۆشتی وشکەوبوی لەهەمانەدا بۆزستان ف قورمه.

**قەیم:** ۱) قەدیم، پێشونە، لەمێژینە؛ ۲) توندو قایم ف ۱) قەدیم؛ ۲) محکم.

**قەیمـــاخ:** ۱) توێژی سەر ماست‌و شیر؛ ۲) ناردو ڕۆنی سوُرەوەکـــراو، میوانی ف ۱) سرشیر، چربی بالای ماست؛ ۲) کاچی.

**قەیماغ:** توێژی سەر شیرو ماست ف سرشیر، چربی روی ماست.

**قەیمی:** قەدیمی، کۆنە ف قدیمی.

**قەیمین:** رەق‌بوُنی ئەندامی لەش ف سفت وسخت شدن اندام.

**قەینا:** ئەدی نا، بۆچی وانیە؟ ف مگر نه اینطور؟.

**قەینات:** قنیات، سەبوُری، ڕازی‌بوُن بە بەشی‌خودا ف قناعت، شکیبایی.

**قەیناخ:** گیایەکە ف گیاهی است.

**قەینـاغ:** قامکـەدەسکێشی چەرمی دروێنەوانان، قامکەوانە ف انگشت پوش چرمی دروگر.

**قەی‌ناکا:** عەیبی نیە، نەتشتە ف مانعی ندارد، باشد.

**قەینتر:** قەنتەرە، قەمتەرە، پردی لە ئاو گوێزتنەوە ف قنطره.

**قەی‌نە:** مەگەرنە؟، مەگین‌وانیە؟ ف مگرنە؟

**قەیوان:** دوگوندی کوردستان بەم ناوە بەعسی کاولی کردوە ف دو روستا به این اسم در کردستان توسط بعثیان ویران شده است.

**قیا:** سەلا، پەسلان، قیامەت، ژیانەوەی دوای مەرگ: (دەستی من دامەنی تۆ ڕۆژی **قیا**) «نالی» ف رستاخیز.

**قیامەت:** قیا ف رستاخیز.

**قیبلە:** روگە، قوبلە ف قبله.

**قیبلەنوما:** ئامرازێکە لا دیاری دەکا ف قبله‌نما.

**قیپ:** ۱) بەلەك‌ئەستوُر؛ ۲) لاسك‌ئەستوُر؛ ۳) بەلەکی پا؛ ۴) لەڕو لاواز ف ۱) ساق کلفت؛ ۲) ساقهٔ کلفت؛ ۳) ساق پا؛ ۴) لاغر.

**قیپ‌بوُن:** لەڕبوُن، گۆشتی‌لەش کەم‌کردن ف لاغرشدن.

**قیت:** ۱) قنج، بڵندوڕاست، راست ڕاوەستاو؛ ۲) زۆپ، زەق؛ ۳) خێل؛ ۴) ڕۆنێ کە شوانکارە دەیدا بەخاوەن‌پەز؛ ۵) پاژێکی بچوُك لە بڕشتی‌دار بە تەور؛ ۶) لقی‌دار ف ۱) راست و بلنـد؛ ۲) برجسته؛ ۳) لوچ؛ ۴) روغنی که شبـان به گلّه‌دار می‌دهـد؛ ۵) تراشـهٔ کوچـك چوب؛ ۶) شاخەی درخت.

**قیتك:** ۱) بەلوُکە؛ ۲) کەشکەزرانی؛ ۳) لقی بچوُکی دار، لقی ناسك ف ۱) چوچوله؛ ۲) کاسهٔ زانو؛ ۳) شاخهٔ نازك درخت.

**قیتکە:** ۱) قیتك؛ ۲) زۆپی پچوُك ف ۱) چوچوله؛ ۲) برجستهٔ کوچك.

**قیت‌وقۆز:** بەژن‌ڕاستی جوان ف بلندبالای زیبا و خوش تیپ.

**قیتە:** ۱) کاورای قیت؛ ۲) هەردوشاخ ڕاست هەڵچو،بۆ بزنی دەڵێن ف ۱) یاروی بلندبالا؛ ۲) دامی که شاخ‌های راست و عمودی دارد.

**قیتەقیت:** برێتی لە جحێڵایەتی، هاتوچۆ بۆ حەزلێ‌کردوُیی ف کنایه از رفت و آمد و حرکات عاشقانه.

**قیتەڵ:** چکۆڵەی زەق‌و زۆپ ف کوچولوی برجسته.

**قیچ:** ۱) کەسێ چاوێکی لە چاوێکی پچوُکترە؛ ۲) بڵند، قوُچ؛ ۳) خوار، خێچ؛ ۴) سپی زۆرسپی؛ ۵) پیچ، کەمـوسکە ف ۱) کسی که یکی از چشمانش کوچکتر است؛ ۲) بلندمخروطی؛ ۳) کج؛ ۴) بسیار سفید؛ ۵) اندك.

**قێچ:** جانەوەرێکی چکۆڵەی ڕەشی ئاماڵ‌سوُرە خوێنی زیندەوەر دەمژێ، کێچ ف کك.

**قیچ‌قیچ:** قرژقرژ، دەنگی کوڵینی ئاو بەنهێم ف صدای غلغل زیاد آب.
**قیچك:** ۱) قیتکە، بەلۆکە؛ ۲) زەردی ئاچوخ ف ۱) چوچولە؛ ۲) زرد روشن.
**قیچ کردنەوە:** ۱) چاوێك قوچاندن‌و بە چاوێك ڕوانین؛ ۲) لە دوورەوە بڵند هاتنەبەرچاو ف ۱) با یك چشم نگاه کردن و چشمی را بستن؛ ۲) از دور بلند دیدن.
**قیچمەز:** ۱) ئابڕوتکاو، بێ‌شەرم؛ ۲) ئاکارخراپ ف ۱) بی‌آبرو؛ ۲) بدرفتار.
**قێچی:** قەیچی، دوێرد، تۆرتۆ، مقەست، مەقەس ف قیچی.
**قێخا:** قۆخا ف کدخدای دە.
**قێد:** ئاڵقەی ئاسن ف حلقۀ آهنی.
**قیدقید:** قدقدی مامر ف قدقد مرغ.
**قیدنینە:** قەیدی‌نیە، قەی‌ناکا ف اشکالی ندارد.
**قیر:** کانزایەکی ڕەشە لە شوێنی چاڵەنەوتی کۆن‌دا دەس ئەکەوێ، قیل ف قیر.
**قیڕ:** ۱) پڕتـاو، چوارناڵە؛ ۲) لەنەکاو بێ دەنگ‌و سەدا: (قیڕ گرتم)؛ ۳) دەنگی مریشك لەترسان ف ۱) تاخت؛ ۲) ناگهان بدون سر وصدا؛ ۳) صدای مرغ از ترس.
**قێڕ:** قوڕ، گونشۆڕ ف فتقی.
**قیرا:** بولێڵە، بەرەبەیان ف اوّل بامداد.
**قیڕات:** ۱) پاژێك لە سی‌و شەش پاژی مسقـاڵ؛ ۲) ئامرازێکە جیوەی تێدا دەگەڵ گەرما بەرز دەبێتەوەو دەگەڵ سەرما دادەکشێ، گەرماپێو ف ۱) قیراط؛ ۲) دماسنج.
**قیراچ:** ۱) پەراوێزی نوسراو؛ ۲) موی سەری پەرژوبڵاوی شانەنەکراو ف ۱) حاشیۀ نوشته؛ ۲) موی ژولیده.
**قیراخ:** کەسێ کە دەلنگ یان قۆڵی هەڵماڵیوە ف پاچەورمالیده.
**قیڕان:** زیقەی مریشك لەترسان ف جیغ مرغ از ترس.
**قیڕاندن:** زیقاندنی مریشك ف جیغ کشیدن مرغ.
**قیڕانن:** قیڕاندن ف نگا: قیڕاندن.
**قیرپاچ:** قورپاچ، قەمچی، قامچی، تازیانە، شەلاخ ف تازیانە.
**قیرتاو:** قیرتێدراو، بەقیر داپۆشراو ف قیراندود، اسفالته.
**قیرتەبەق:** جۆرێ نانەشانی لەتوڵ‌تەنراوی قیلەتاوکراوە ف سبد قیراندود.
**قیرچان:** سیڕەسیڕ لە ددان هاتن ف صدای برهم ساییده‌شدن دندانها.
**قیرچاندن:** سیڕەسیڕ لە ددان هێنان ف صدا از دندانها درآوردن.
**قیرچین:** قیرچان ف نگا: قیرچان.
**قیڕسیچم:** ۱) پێ‌چەقێن، نەساز؛ ۲) ڕەزیل، ڕژد ف ۱) لجباز؛ ۲) خسیس.
**قیڕسیچمە:** قیڕسیچم ف نگا: قیڕسیچم.
**قیرقاج:** خوارەکەو پێچەکە ف اریب.
**قیرقاچ:** قیرقاج ف اریب.
**قیڕقیڕ:** هەراو زەنازەنا: (کوڕۆ ئەوچ قیڕقیڕاتەیە) ف هەو و جنجال.
**قیڕوسیا:** چش، هەرچی ئەبێ با ببێ ف هرچه باداباد.
**قیروقاج:** قیرقاج ف اریب.
**قیروقاچ:** قیرقاج ف اریب.
**قیڕە:** ۱) قرەی بۆق؛ ۲) زیقەی باڵدار؛ ۳) کەوتنی دەنگ لە زیقەدا ف ۱) صدای قورباغە؛ ۲) جیغ پرنده؛ ۳) گرفتگی صدا از جیغ زیاد.
**قێڕە:** قوڕ، گونپەنەماو ف فتقی.
**قیڕەبوون:** دەنگ کەوتن لەبەر زیقاندن ف خفه‌شدن صدا از جیغ زیاد.
**قیرەتاو:** قیرتاو ف قیراندود، اسفالته.
**قیڕەقیڕ:** زیقەو هەرای زۆر ف جیغ و فریاد زیاد.
**قیڕەگون:** کەسێ لە زیڕاندنی زۆرەوە قوڕ بو بێ ف کسی که از جیغ زیاد فتقی شده.
**قێڕەگون:** گونقوڕ ف فتقی.
**قیری:** ڕەش بە ڕەنگی قیر ف مشکی، سیاه همرنگ قیر.
**قیرین:** قیری ف سیاه به رنگ قیر.
**قیڕین:** ۱) زیقاندن؛ ۲) بەرەنگی‌قیر ف ۱) جیغ کشیدن؛ ۲) به رنگ قیر.
**قیرینە:** قیرتێ‌هەڵسواو ف قیراندود.
**قیز:** ۱) دۆت، قز؛ ۲) بێز ف ۱) دختر؛ ۲) حال از دیدن چیزی بهم خوردن.
**قێز:** ۱) بێز، دڵ‌تێکچـوون لە دیتنی شتێ؛ ۲) وشـەیەکـە لە بازی‌دا واتا: تەسلیم ف ۱) دل بهم آمدن از دیدن چیزی؛ ۲) اصطلاحی در بازی به معنی تسلیم.
**قێزبوون:** ۱) تەسلیم‌بوون لە بازی‌دا؛ ۲) ناشیرین‌بوون ف ۱) تسلیم شدن در مسابقه؛ ۲) زشت شدن بعد از زیبایی.
**قێزبوونەوە:** دڵ‌شێوان لە دیتنی شتێ ف دل بهم آمدن از دیدن چیزی.
**قێزشێوان:** قێزبوونەوە ف نگا: قێزبوونەوە.
**قێزشێویان:** قێزبوونەوە ف نگا: قێزبوونەوە.
**قێزشێویانەوە:** قێزبوونەوە ف نگا: قێزبوونەوە.
**قیزك:** دارێکی لێرەوارە ف درختی است جنگلی.
**قێزکردن:** قێزبوونەوە ف نگا: قێزبوونەوە.
**قێزکردنەوە:** قێزبوونەوە ف نگا: قێزبوونەوە.
**قیزوبیز:** قیزکردن ف دل بهم‌آمدن.
**قیزۆك:** پوکاوڵە، چەموڵە، چەمبوڵە ف ام کردن، پنجه‌گذاشتن.
**قێزە:** ناشیرین ف زشت.
**قیزەون:** قێزەون ف نگا: قێزەون.
**قێزەون:** ۱) شتێ کە مرۆ بێزی لێ دەکـا؛ ۲) مرۆی بەبێز کە کەم شت دەخوا، دژخۆر ف ۱) چیزیکه حال آدم را بهم می‌زند؛ ۲) کسی که زود دلش بهم می‌خورد.
**قیژ:** ۱) دەنگی تیژ، زیڕە؛ ۲) قاژو ف ۱) جیغ؛ ۲) زَغَن.
**قیژاندن:** زیڕاندن ف جیغ کشیدن.
**قیژانن:** قیژاندن، زیڕاندن ف جیغ کشیدن.
**قیژقیژۆك:** زارۆکێ کە زۆر دەزیقێنێ ف بچۀ جیغ جیغو.

**قیژك:** قەلەڕەشە [ف] کلاغ.

**قیژلاندن:** وەچوّقەچوّق خستنی ڕوّن [ف] گداختن روغن.

**قیژوّك:** باڵداریکی کەسکە لە ڕیشوّلە زلترە [ف] پرندهٔ سبزقبا.

**قیژوواژ:** زەنازەنا [ف] داد و فریاد.

**قیژ ووڕ:** هەراهەرا، زەنازەنا [ف] جیغ و داد وفریاد.

**قیژوهوّڕ:** قیژووڕ [ف] جیغ و داد.

**قیژە:** قیژ، زیقە [ف] جیغ.

**قیژەقیژ:** ۱) زیقەی زوّر؛ ۲) فەرمان بە بێدەنگ بوُن: (توخوا قیژەقیژ) [ف] ۱) جیغ زیاد؛ ۲) فرمان به خاموشی سر وصدا.

**قیژە کردن:** زیڕەکردن [ف] جیغ کشیدن.

**قیژین:** قیژاندن [ف] جیغ کشیدن.

**قیس:** دەرفەت، هەل، فرسەت: (لە قیسم چو، لە قیسی خوّم دا) [ف] فرصت بدست آمده.

**قیسپ:** داریکە بوّ پەرژین دەچەقێندرێ، قسپ [ف] چوب ثابت دیوارهٔ پرچین.

**قیست:** ۱) گیایەکە؛ ۲) قەرزدانەوەی پاژپاژ [ف] ۱) گیاهی است؛ ۲) قسط وام.

**قیسك:** چیکڵدانە [ف] ژاغر، چینەدان.

**قیسکە:** ۱) قیسك؛ ۲) منالّی چکوّلەی پوّتەکە [ف] ۱) ژاغر، چینەدان؛ ۲) کودك لاغر و فسقلی.

**قیش:** ۱) بانو، بانە، بان، دەشتی بڵندتر لە دەوروبەری خوّی؛ ۲) قوڕ، حەڕێ؛ ۳) قەڵشی لێو [ف] ۱) فلات؛ ۲) گِل؛ ۳) ترك لب.

**قیشاڤ:** ۱) قوڕاو، لیتە، چلّپاو؛ ۲) لێوی قەڵشیو [ف] ۱) لجن؛ ۲) لب ترك برده.

**قیفار:** درکێکی سپیە [ف] خاربنی است سفید.

**قیفـەرێ:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد [ف] نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**قیڤار:** قیفار [ف] نگا. قیفار.

**قیق:** ۱) دالّگوّشت، زەعیف؛ ۲) مل باریك [ف] ۱) لاغر؛ ۲) گردن باریك.

**قیق لوّقی:** دەنگی خوێندنی کەڵەباب [ف] بانگ خروس.

**قیقی:** ۱) دارکوتکە؛ ۲) قوقوی کەڵەشێر؛ ۳) برێتی لە مریشك [ف] ۱) دارکوب؛ ۲) صدای خروس؛ ۳) کنایه از ماکیان.

**قیقی داوکە:** باڵداریکە [ف] پرنده‌ای است.

**قیل:** ۱) قوڵ؛ ۲) کەڵپی دڕنـدە، ددانی پێشەوەی دڕندە؛ ۳) قیر [ف] ۱) ژرف؛ ۲) دندان ناب درنده؛ ۳) قیر.

**قیڵ:** گوانی ئاژەڵی شیردەر [ف] پستان دام شیرده.

**قیلکـە:** ۱) چیلکە؛ ۲) حیلکەی پێکەنین [ف] ۱) ساقه و چوب کوچك خلال مانند؛ ۲) هرهرخنده.

**قیلە:** خزم، قەوم [ف] خویشاوند.

**قیلەتاو:** قیرتاو [ف] اسفالته.

**قیلەوقاج:** قیرقاج [ف] اُریب.

**قیلەوقانج:** قیرقاج [ف] اریب.

**قیم:** ۱) ڕازی بوُن: (قیما من نایە)؛ ۲) بەس و کیفایەت [ف] ۱) رضایت؛ ۲) بەس، کافی.

**قیم ئانین:** ڕازی بوُن [ف] راضی بودن.

**قیم پێ ئانین:** پێ ڕازی بوُن، پێ قایل بوُن [ف] روا دیدن.

**قیمە:** گوّشتی ئەنجنراو [ف] گوشت خردشده، قیمه.

**قیم هاتن:** ڕازی بوُن [ف] راضی شدن.

**قیمەت:** نرخ، بایی [ف] قیمت.

**قیمەت دار:** ۱) بەجەوهەرو هونەر؛ ۲) گران [ف] ۱) هنرمند؛ ۲) قیمتی.

**قیمە کردن:** ئەنجنینی گوّشت [ف] چرخ کردن گوشت.

**قیمە کرن:** قیمەکردن [ف] چرخ کردن گوشت.

**قیمـە کێش:** ساتـوّری چەمـاوی گوّشتوردکـردن: (ڕوت وەکوُ ئاگر موژەت وەك شیش و ئەبروّت **قیمە کێش**/میڕوەحەت زلفو کەبابت جەرگی پارەی ناری بە) «ناری» [ف] ساتور و قیمه‌کش.

**قیمیش:** ڕەوادیتن [ف] روادیدن.

**قین:** ۱) قن، قنگ؛ ۲) رق، توّڕەیی، قەڵسی، رك، قار [ف] ۱) کون؛ ۲) کینه.

**قینات:** قنیات، سەبوُری [ف] شکیبایی.

**قیناوی:** رکوُنی [ف] کینه‌ور.

**قین ئەستـوُر:** کەسێ کە درەنـگ لە توّڕەیی خاودە بێتـەوە [ف] کسی که خشمش دیر فرونشیند.

**قێنبنە:** گیایەکی بەهاریەو دەیخوّن [ف] گیاهی است خوردنی.

**قینجك:** قونجك [ف] دنبالچهٔ میوه.

**قین جواندن:** ڕك هەڵساندن [ف] خشم برانگیختن.

**قین جوین:** ڕك هەڵسان [ف] سرکین آمدن.

**قینچك:** قونجك [ف] دنبالچهٔ میوه.

**قین خواردنـــەوە:** ڕك لەبیرخـــوّ بـــردنـەوە، پیش خواردنـەوە [ف] خشم فروخوردن، کین در دل نهفتن.

**قین دار:** بەقین، دڵ بڕ ڕك [ف] خشمگین.

**قین کێشان:** رك هەڵگرتن [ف] کینه‌توزی، کین به دل گرفتن.

**قینـــگ:** قن، قنـــگ: (زوّر بە تەعـــر یزو کینـــایە لە بنـی سینـگـت بەم/بەگ ئەفەندی بە سەراحەت لە کونی **قینگت** بەم) «شێخ ڕەزا» [ف] کون.

**قین گرتن:** کەوتنە سەرڕك، پێ چەقاندن [ف] پافشاری از سر لَج، لَج کردن.

**قین لەبەر:** رکوُنی، قین لەدڵ [ف] کینه‌توز.

**قین لەدڵ:** رکوُنی [ف] کینه در دل، کینه‌ور.

**قین لەسك:** قین لەدڵ، رکوُنی [ف] کینه دردل.

**قین لەقنە:** کلك هەڵتەکێنە، دوهەژینك [ف] دُم جُنبانك.

**قین لێ بوُن:** خوّش نەویستن، رك لێ بوُنەوە [ف] دوست نداشتن.

**قین لێ هەستان:** لێ توّڕە بوُن [ف] از کسی به خشم آمدن.

**قین لێ هەڵستان:** قین لێ هەستان [ف] از کسی به خشم آمدن.

**قین لێ هەڵگرتن:** توّڕەبوُن و چاوەنوّڕی هەل بوّ توّڵە [ف] کینه از کسی در دل گرفتن.

**قین‌ون:** قیناوی [ف] کینه‌ور.

**قینه‌به‌ری:** ڕکه‌به‌ری [ف] هم‌چشمی.

**قینه‌ون:** قین‌ون، قیناوی [ف] کینه‌ور.

**قین‌هه‌ستان:** ڕك‌هه‌ستان [ف] خشمگین شدن.

**قین‌هه‌ستاندن:** ڕك‌هه‌ستاندن [ف] خشم برانگیختن.

**قین‌هه‌ڵسان:** ڕك‌هه‌ڵسان [ف] بخشم آمدن.

**قین‌هه‌ڵستاندن:** ڕك‌هه‌ستاندن [ف] خشم برانگیختن.

**قین‌هه‌ڵگرتن:** ڕك له‌دڵاهێشتنه‌وه [ف] کینه دردل گرفتن.

**ك:** ۱) لەپـێش وشـەدا بە مانـای کە، بۆئـەوە: (مـن واتـم **کنـەچـی**)؛ لەپاش‌وشـەدا ۲) تاك، تەنـیا: (گاك بەمانـای‌تاقـەگایەك)؛ ۳) هێمابۆناسیاوێ کە ناتەوێ ناوی‌بەری: (**مێرك، ژنك**)؛ ۴) ئامرازبُون دەگەیەنێ: (کـو تك، خێشك)؛ ۵) بۆپچوُك‌شاندانە: (**کنك، کوڕك**)؛ ۶) **بەمانای‌زۆرزۆر: (خە مۆك، گرینۆك)** ف ۱) به عنوان پیشوند به معنی برای اینکـه؛ به عنـوان پسوند ۲) یکی، یك دانه؛ ۳) اشاره به مشـارٌالیه شنـاختـه شده؛ ۴) پسـوند ابزار؛ ۵) پسوند تصغیر؛ ۶) به معنی بسیار زیاد.

**کا:** ۱) کوا، له کوه؟؛ ۲) پاژی پچوُکی لاسکه دەخلْ؛ ۳) پاشگری بەواتا: یەکدا: (**له پڕێکا، له ڕۆژ ێکا**)؛ ۴) وشەی ڕێزلێ نانی براگەورە: ( **کا** حەسەن)؛ ۵) بکات: (**خوا روحم کا**)؛ ۶) دادەی، ئابزانم: ( **کا** وە رە، **کا** ببینم)؛ ۷) بلا، با، بهێڵە: (**کا بچێ بزانم چی دەکا؟**) ف ۱) کو؟، کجا است؟؛ ۲) کاه؛ ۳) پسـوند به معنی در یکی؛ ۴) اصطلاح احترام به برادر بزرگتر، داداش؛ ۵) کناد، کند؛ ۶) ببینم، بدانم؛ ۷) باشد، بگذار.

**کائین:** قاویچ، قاویش ف نشخوار.

**کاب:** ۱) قاپ، میچ، جگ، چوُ؛ ۲) قاپ، گوێزنـگ ف ۱) شتـالنگ، قاب؛ ۲)قوزك پا.

**کابا:** جگ، میچ، دەق، قاپ، کاب ف قاپ.

**کابان:** ۱) ژنی ئاگاداری ماڵ؛ ۲) ناوە بۆ ژنان ف ۱) کدبانوی خانه؛ ۲) نام زنانه.

**کابانەتی:** ماڵڕاگرتنی بەچاکی، بناوانی ف خانەداری کردن.

**کابانی:** کابانەتی ف خانەداری کردن.

**کابانێ:** ۱) جگێن، میچێن؛ ۲) ئەی کابان ف ۱) قاب‌بازی؛ ۲) ای کدبانو.

**کابچك:** جومگەی دەست ف مُچ دست.

**کابـرا:** ۱)فلان، کەسێ کە ناوی نابەن: ( **کابرا تۆ کێی**)؛ ۲) کەسێ کە نای ناسـن: ( **کابــرا یەکـم دیت**) ف ۱) یارو، فلان؛ ۲) کسـی که ناشناس است.

**کابرەش:** ۱) قاپڕەش، کوێتی داوین تاریك؛ ۲) شوُم جوت‌قۆشه ف ۱) کمیت پا سیاه؛ ۲) نحس.

**کابگر:** ۱) برێتی له جنێوفرۆش؛ ۲) برێتی له پاش‌ملەبێژ ف ۱) کنایه از دُشنام‌دهنده؛ ۲) کنایه از غیبت‌گوی.

**کابۆخ:** بەشە چێندراوێ کە لە هاوساکانی تێراوتر و گەش ترە ف بخشی از محصول که از بقیه پُر بارتر باشد .

**کابۆك:** ۱) باڵدارێکه کێوی. حەمایەت دەبێ، له کەو پچوکترەو گۆشتی دەخـورێ بە زۆر ڕەنگـان هەیە، کۆتـر، کەڤۆك؛ ۲) جێگەی سانەوەو خاتێکردنی باڵدار، لانە، هێلانە ف ۱) کبوتر؛ ۲) آشیانه.

**کابە:** ۱) خانەی خودا، روگەی ئیسلام؛ ۲) میچ، کاب؛ ۳) کەشکەژنۆ؛ ۴) جومگەی‌دەست و پا؛ ۵) قەسەڵ، کای‌درشتی بەرماو لە ئاخوڕدا ف ۱) کعبـه؛ ۲) قاپ؛ ۳) کاسهٔ زانو؛ ۴) مُچ دست و پا؛ ۵) کاه درشت مانده در آخور.

**کابەشاك:** بەخت‌و ئیقباڵ ف بخت و اقبال، شانس.

**کابـەك:** ۱) کەشکـەزرانی؛ ۲) جومگـەی دەست‌و پا؛ ۳) قەسـەڵ ف ۱)کاسهٔ زانو؛ ۲) مُچ دست و پا؛ ۳) کاه درشت مانده در آخور.

**کابهوُر:** برێتی له کورتەباڵا، کنْك ف کنایه از قد کوتاه، کوتوله.

**کابەی:** میچێن، کاپێن، کابانێ، قاپێن ف قاپ بازی.

**کاپ:** قاپ، جگ، میچ، چوُ ف شتالنگ، قاب.

**کاپـان:** ۱) ڕێگـەی تەسـك‌و تەنگەبەر؛ ۲) جگێن؛ ۳) کونی فرەوان له میچی خانودا؛ ۴) نەغمەی بن‌دیوار کە پیاوی پێدا بچێ ف ۱) راهرو تنگ؛ ۲) قاب‌بازی؛ ۳) سوراخ گشاد در سقف خانه؛ ۴) نقب کف اطاق.

**کاپانێ:** کابانێ، جگێن ف قاب‌بازی.

**کاپچك:** جومگەی‌دەست ف مُچ دست.

**کاپـك:** ۱) پەتـك، پەت، پارچەگوریس؛ ۲) جگی چکۆڵە ف ۱) رسن پاره، ریسمان کوتاه؛ ۲) قاب کوچك.

**کاپۆ:** ۱) خانوی باڵدار، هێلانە، هێلین، لانە؛ ۲) بێقل ف ۱) آشیانە؛ ۲) بینی.

**کاپـۆخ:** ۱) پوُش و گیای گێرە کـراو، گیای ئەنجناو؛ ۲) کەسێ گیا ورد دەکا ف ۱) گیاە کوبیدە؛ ۲) کسی کە علوفە می‌کوبد.

**کاپۆر:** توُتنی زۆر خراپ، رەشکەتوُتن ف توتون بد سیاهرنگ.

**کاپۆك:** ۱) کابۆك؛ ۲) پێوەندی ئەسپ لەزنجیر ف ۱) نگا: کابۆك؛ ۲) پابند زنجیری است.

**کاپـــۆل:** ۱) قاپێلك؛ ۲) قاپێلکـەسـەر، ۳) گیای وردکـراو، گزرە؛ ۴) قەسەڵ؛ ۵) کای‌رەگەڵ حەڕی‌بۆ بان‌سواخ‌دان ف ۱) پوستۀ توخالی؛ ۲) جمجمە؛ ۳) علوفۀ کوبیدە؛ ۴) کاە درشت ماندە درآخور؛ ۵) کاهگل.

**کاپۆڵ:** ۱) قاپێلکەسەر؛ ۲) بێقل، پت ف ۱) جمجمە؛ ۲) بینی.

**کاپۆڵك:** کاپۆڵ ف نگا: کاپۆڵ.

**کاپۆلە:** کاپوُلە ف پیمانۀ کوچك آسیابان.

**کاپوُلە:** قەپوُلە، قەپوُیلە ف پیمانۀ کوچك آسیابان.

**کاپەك:** کەپەك، سقی، کرپك ف کفك.

**کاپێچ:** نەخـۆشیەکی ڕەشەولاّخە لە کای زۆرخواردنەوە توُشی دێت ف نوعی بیماری دام.

**کات:** ۱) دەم، سات، تاو؛ ۲) خێرۆك؛ ۳) زەمین، قاد: (**شۆرە کات**)؛ ۴) کەللەسـەر؛ ۵) پشت‌مل ف ۱) وقت؛ ۲) نگا: خێرۆك؛ ۳) زمین؛ ۴) کلّە، جمجمە؛ ۵) پس گردن.

**کاتـا:** ۱) لەکـوێ؟؛ ۲) لەکـام‌لا؟؛ ۳) جۆرێ کولێرە کە لەبن ژێلەمۆدا دەبرژێ ف ۱) کجا؟؛ ۲) کدام طرف؟؛ ۳) نوعی گردە نان.

**کاتات:** ۱) قەحف، کەللەسەر؛ ۲) پشت‌مل ف ۱) کلّە، جمجمە؛ ۲) پس گردن.

**کاتار:** پۆپەی کەڵەشێر ف تاج خروس.

**کاتب:** ۱) حیسـابگـەر؛ ۲) نوسـەر؛ ۳) سەرژمێر ف ۱) حسابدار؛ ۲) نویسندە؛ ۳) سرشُمار.

**کاتبەش:** کارپێ‌سپێراوی سەرژمێری ف مسؤول سرشماری.

**کات‌ژمێر:** دەم‌ژمێر، سەحات ف ساعت.

**کاتك:** کەللەسەر، قەحف، کات ف جمجمە، کلّە.

**کاتـۆر:** ۱) لەوەڕگای لەوەڕ لێ نەمـاو: (تـەواو **کاتۆر** بوە)؛ ۲) پۆپەی کەڵەشێر، کاتار ف ۱) چراگاە لخت‌شدە؛ ۲) تاج خروس.

**کاتـــە:** ۱) لکی تازە پاش سەرچن کردن، وەچ: (**کـــاتـــەی توُتن**)؛ ۲) خێرۆك؛ ۳) برێتی لە گورگ؛ ۴) پێشە، ئێسقان، هەستی ف ۱) جوانۀ نو بعد از اختە کردن گیاە؛ ۲) نگا: خێرۆك؛ ۳) کنایە از گرگ؛ ۴) استخوان.

**کاج:** ۱) دارێکی گەڵادەرزی جەنگەڵە؛ ۲) زوُرك ف ۱) درخت کاج؛ ۲) تپۀ ماسەای.

**کاجین:** کامە؟، کێهە؟ ف کدامین؟.

**کاجینە:** زوُرکان، دەشتێ کە تەپۆڵکە تەپۆڵکەی پچوکی تێدا ف دشت ماهوری.

**کاچ:** ۱) ئامـرازی سەرقـوُڵی دەسـك داری پچوُك بۆ شێو پێ‌خواردن، کەچی، کەفچی، کەوچك؛ ۲) قاچ، لنگ؛ ۳) شتی بێ‌نرخی ناوماڵ؛ ۴) خزگەمـاسی ف ۱) قاشق؛ ۲) پا؛ ۳) خرت و پرت بی‌ارزش؛ ۴) پناهگاە ماهی در زمستان.

**کاچاخ:** بەچکەگامێشی دوبەهار دیتو، قاچاخ ف گوسالۀ دوسالە.

**کاچانی:** دەفرو ئامان، قاپ‌و قاچاخ ف ظروف آشپزخانە.

**کاچك:** کاچ، ئامرازی شێو پێ‌خواردن ف قاشق.

**کاچوکولۆز:** خرت و پرتی بێ‌قیمەت ف خرت و پرت بی‌ارزش.

**کاچوکولوُسك:** کاچوکولۆز ف خرت و پرت بی‌ارزش.

**کاخ:** ۱) قەسـر، کۆشـك؛ ۲) بژار؛ ۳) لۆدەکـای دەشت کە بۆ زستـان گڵەبان دەکرێ ف ۱) کاخ؛ ۲) وجین؛ ۳) کاهی کە برای زمستان در دشت نگهداری می‌شود.

**کاخڵی:** قاخڵی ف کاجیرە.

**کاخیل:** ۱) سەوزەی چیمەن؛ ۲) پوُشی دەشت کە لەگیشە دەدرێ ف ۱) سبزۀ چمن؛ ۲) خس و خاشاك دشت و صحرا کە جمع شدە باشند.

**کاد:** ۱) قاد، عەرد، زەمین، زەوی؛ ۲) مەیدان: (**کـــادا** شەڕی) ف ۱) زمین: ۲) میدان.

**کادان:** ۱) عەماری کاتێکردن؛ ۲) ناوی دێ‌یەکە؛ ۳) فەرەنجی ف ۱) کاهدان؛ ۲) نام دهی است؛ ۳) پالتو نمدی.

**کادانە:** ڕەسەنەئەسپێکە دەڵێن لەروسیاوە هاتگە ف نژادی از اسب است کە گویا از روسیە آمدە.

**کادڕ:** شەنەی ئاسن ف افشون آهنی.

**کادز:** سپیایی ناوەنـدی عاسمـان لەشـەودا، کاکێشـانی عاسمـان ف کهکشان، مجرە.

**کادك:** بابۆڵە، تیکەی درێژ ف ساندویچ.

**کادو:** دوُکەڵ، دوکێل، دو ف دود.

**کادە:** کولیچە ف کلوچە.

**کادی:** کادو، دوُکەڵ ف دود.

**کادین:** کادان، عەماری کاتێکردن ف کاهدان.

**کادێن:** کادان، عەماری کا ف کاهدان.

**کادێن‌مێشی:** شوێنی خلێفـەمێشـان، جێگـەیەك کە پلوُرەهـەنگی لێ داندراون ف کندوی زنبور عسل.

**کادینەمێش:** خەلێف، پلوُرە ف زنبور عسل.

**کار:** ۱) شوُل، خەبـات؛ ۲) توانـا، تاقەت: (**ئەز کار م تە نکاری**)؛ ۳) بالـوُکـە؛ ۴) بەچکەبزنی چکۆڵەی تازەزاو؛ ۵) میوەی نەگەیشتو؛ ۶) نەکـولاّو، خاو؛ ۷) کەسێ خەریکی خەبـاتە: (**کرێکار**)؛ ۸) چاندن: (**دێمـەکـار، تەڕەکـاری**)؛ ۹) دەسکـرد: (**کـاری ئەستەموڵە**)؛ ۱۰) قازانجی سەودا؛ ۱۱) بەچکـەی ئاسك: (**کارمامز**)؛ ۱۲) روداو؛ ۱۳) ڕچە، کۆرەڕێ؛ ۱۴) خوێڵێن، کانی‌خوێ ف ۱) کار؛ ۲) توان، تاب؛ ۳) زگیل؛ ۴) کهرە، بزغالۀ نورسیدە؛ ۵) کال، میوۀ نارس؛ ۶) ناپختە؛ ۷) کنندۀ کار؛ ۸) کشت؛ ۹) ساختە؛ ۱۰) سودبازرگانی؛ ۱۱) بچۀ آهو؛ ۱۲) حادثە؛ ۱۳) کورەراە؛ ۱۴) چشمۀ آب شور.

**کارا:** ۱) زۆر شوڵکەر؛ ۲) کوچك، بەرد ف ۱) کاری، فعّال؛ ۲) سنگ.

**کارّاد:** کەوەر، کەوەرگ، لەسەوزیجات ف تره.

**کارّاژ:** شوێنی راگردنی ترۆمبیل لە خانوُدا ف گاراژ.

**کاراس:** کاروش، گیایەکە ف گیاهی است.

**کاراك:** زەمینێ کە ئەسپابی پێویستیژیانی تێدایەو دەیدەنەوە، کان ف معدن.

**کارامە:** کارزان، چێ، راهاتوُ لە کار ف کارامد.

**کارامەد:** کارامە ف کارامد.

**کارامەیی:** زانایی لە کار، تەڕدەستی ف مَهارت.

**کاران:** چەندکار ف کارها.

**کارّان:** دەنگی بەقەوی مەڕو بەرخ ف صدای بلند بره و میش.

**کارانە:** ۱) مزی حەقدەست؛ ۲) شەرتەشوانی بەخێوکەری بەچکەبزن ف ۱) مُزد؛ ۲) مُزد چوپان برای مراقبت از بُزغالەها.

**کاربان:** کاروان، قافلە ف کاروان.

**کاربــــز:** ۱) حاکم، میر، کەیخـودا؛ ۲) بنیادەمی زۆر ئازا لە کار ف ۱) حاکم؛ ۲) کارگر خوب، کاربر.

**کاربرا:** هاوبەشی لە کاردا، هاوکاری ف همکاری.

**کاربوُران:** ئاوردو، ئاردو، سوتەمەنی ف سوخت.

**کاربەدەس:** دەسەڵاتدار ف مصدر کار، در رأس کار.

**کاربەدەست:** کاربەدەس ف نگا: کار بەدەس.

**کاربەردان:** وازلەکارهێنان ف دست از کار کشیدن.

**کاربەند:** ۱) پیشە، سنعات؛ ۲) دۆز، مەبەستومەرام ف ۱) پیشە، شغل؛ ۲) مقصود و مرام.

**کاربین:** پسپوڕ، زانالەکار ف کاردان.

**کاربینی:** کارزانی، پسپوڕی ف کاردانی.

**کارپـوُچ:** ۱) خشتی سوُر؛ ۲) کەسێ کە کاری بێبەهـرە دەکا ف ۱) آجر؛ ۲) بیهودە کار.

**کارپیچ:** کارپوُچ ف نگا: کارپوُچ.

**کارپێچ:** زۆر خەریکی کار ف بسیار سرگرم کار.

**کارپێسپاردن:** قەوینتی کردن بۆ کارێك ف سفارش کاری بە کسی.

**کارت:** ۱) کاتە، کات، خێروٚك؛ ۲) چارەك، بەشێك لەچوارپاژ؛ ۳) پەتە، پسوُلە ف ۱) نگا: کاتە، کات، خێروٚك؛ ۲) رُبع، یك چهارم؛ ۳) کارت.

**کارتش:** چاندن، تۆموەشاندن ف بذرافشانی.

**کارتك:** مڕمەند، بڕبەند ف سوهان.

**کارتموك:** چاوەگا ف گیاهی است.

**کارتموڵ:** گیایەکە گوڵێکی درشتی زەرد دەکا، بابُونەی چاوەگا ف بابونۀ گاوچشم.

**کارتوٚڵ:** پەتاتە، سێفەزەمینە، سێفزەمینی ف سیبزمینی.

**کارتە:** کاتە ف نگا: کاتە.

**کارتەن:** کارتش، تۆموەشاندن ف بذرافشانی.

**کارتی:** بڕبەندی پچوُكو نەرم ف سوهان کوچك و نازك.

**کارتیخ:** کارتی ف نگا: کارتی.

**کارتیك:** ۱) کارتی: ۲) سەروەسیەت ف ۱) نگا: کارتی؛ ۲) قَیّم.

**کارتێکردن:** تاسیرلێکردن ف تأثیر کردن در چیزی.

**کارتێکەر:** تاسیر بەخش ف مؤثر.

**کارتێ کەوتن:** کار بەکەسێ بوُن ف باکسی کار داشتن.

**کارتیموٚك:** کارتموٚك ف بابونۀ گاوچشم.

**کارتیموٚل:** کارتیموٚل ف بابونۀ گاوچشم.

**کارتێنك:** جاڵجالوُکە، جوٚلاتەنە، کاکڵەموُشان ف عنکبوت، تارتنك.

**کارتێنە:** ۱) کارتێنك؛ ۲) پەتاتە، سێفەزەمینە ف ۱) عنکبوت؛ ۲) سیبزمینی.

**کارجف:** داموەزگای هاوبەشی لە بازرگانیدا ف شرکت سهامی.

**کارچك:** هەرمێ، هەمروٚ ف گُلابی.

**کارچو:** چەقوٚ ف چاقو، کارد.

**کارچین:** جوٚرێ هەرمێ کە بەکاڵی لێدەکرێتەوە ف نوعی گلابی.

**کارخانە:** ۱) جێگەی کاری پیشەسازان؛ ۲) برێتی لە جندەخانە ف ۱) کارخانە؛ ۲) کنایە از فاحشەخانە.

**کارخانەچی:** برێتی لە دەویت ف کنایە از جاکش.

**کارخستن:** خستنەخەبات ف بە کار انداختن.

**کارخونە:** جێگەی پیشەسازی ف کارخانە.

**کارخەزال:** کارمامز، بەچکەئاسك، ئاسکوٚڵە ف آهو بچّه.

**کارد:** چەقوٚ، تیخی بەدەسکی پچوُك ف کارد.

**کاردا:** ئەوکاری کراوە، بەهرەی کار ف کارکرد.

**کاردانك:** زێدان، پزدان، مناڵدان ف رحم.

**کاردانەوە:** بەهرەوەرگرتن، لە کار ف حاصل کار.

**کاردروس:** کارامە ف کاردان، کارامد.

**کاردروست:** کاردروس، کارامە ف کاردان.

**کاردش:** ۱) سازدان؛ ۲) کردن، کرْن ف ۱) مُهیّا کردن؛ ۲) انجام دادن.

**کاردك:** مڕمەندی بچوُك، بڕبەندی گچکە ف سوهانك.

**کاردوُ:** ۱) گیایەکی، گەڵاپانە لەناو سماقاوا زەردی دەکەنو بە چێشتی لێدەنێن؛ ۲) توٚمی گیایەکە لە گەنم دەکاو رەنگی رەشە ف ۱) گیاهی است؛ ۲) بذر گیاهی است شبیه گندم.

**کاردوپـەنیر:** برێتی لە دوژمنایەتی دایمیو بێبڕانەوە نێوانی دو دژ ف کنایە از دشمنی دائمی.

**کاردوٚخ:** ۱) ناوێکــی کوٚنــی کوردە؛ ۲) چیایەکـی بەرزە ف ۱) نام باستانی کرد؛ ۲) نام کوهی است.

**کاردوٚخی:** هوٚزێکە لەکوردستانێدا دەژین ف نام طایفەای از کُردها.

**کاردوٚژە:** ۱) دارکــوٚڵـین بە تیخ؛ ۲) برێتی لە چڵێسو زوٚرخــوٚر؛ ۳) کەمکوٚڵ، گوێزیتەڕ ف ۱) کندەکاری چوب؛ ۲) کنایە از پرخور؛ ۳) گردوی نارسیدە.

**کاردوٚغـە:** وشـەیەکـە بوٚ پوُچبوُنـەوەی شوُمی دەڵێن: (قـەڵ قڕاندی کاردوٚغە) ف اصطلاحی است برای باطل کردن نحوست گفته می‌شود.

**کاردوٚك:** ناوێکی کوٚنی کوردە ف نام باستانی کرد.

**کاردوەڕەشە:** جۆرێ گیای کاردوُ ف نوعی «کاردوُ».

**کاردوەکوڕانە:** کاردوُی بەنێرتك ف نوعی «کاردوُ».

**کاردوەمارانە:** جۆرێ کاردوُی خراپ ف نوعی «کاردوُ»ی نامرغوب.

**کاردەپەلە:** ١) پەڕەسێلکە؛ ٢) نەخۆشی زیپکەدەرکردن بە سەرما ف ١) چلچله؛ ٢) نوعی بیماری جوش زدن پوست از سرما.

**کاردەستی:** سنعاتێ بە دەس کرابێ، دەسکار ف کاردستی.

**کاردی:** کاردوُ ف نگا: کاردوُ.

**کاردیتو:** راهاتوُ لە کار ف باتجربه در کار.

**کاردیتی:** کاردیتو ف باتجربه در کار.

**کاردیدە:** کاردیتو ف باتجربه در کار.

**کاردی کەردش:** ١) چەقۆسازدان؛ ٢) وەستای چەقۆیان ف ١) چاقو ساختن؛ ٢) استادکار چاقوساز.

**کاردیە:** کاردیتو ف باتجربه در کار.

**کارڕاست:** ١) کار دروست؛ ٢) کار پێك‌هاتوُ: (یاخوا **کارت راست‌بێ**) ف ١) دُرُستکار؛ ٢) کار بر مرام.

**کارزان:** فامیدە لە کار ف کاردان.

**کارزۆر:** ١) بێگار؛ ٢) کەسێ شوُلێ وی گەلەکە ف ١) کار اجباری؛ ٢) پرکار.

**کارزۆرەکی:** بێگار ف کار اجباری.

**کارژ:** توێژەمار ف پوسته‌ای که مار می‌اندازد.

**کارژۆڵە:** بەچکەبزنی ساوا ف کهره، بزغاله.

**کارژەڵە:** کارژۆڵە ف بزغاله.

**کارژیلە:** کارژۆڵە ف بزغاله.

**کارس:** ١) زوڕات، هەرزنەگەورە؛ ٢) هەرزن ف ١) گاورس، ذرّت؛ ٢) ارزن.

**کارساز:** ١) کەسێ کار بۆ کەسێ پێك دێنێ؛ ٢) ناوە بۆ خوا ف ١) چاره‌ساز؛ ٢) نامی برای خدا.

**کارسازی:** ١) پێك‌هێنانی کار؛ ٢) خۆ ئامادەکردن ف ١) فراهم کردن؛ ٢) خود را مهیّا ساختن.

**کارڤانکوژ:** ئەستێرەکە، کاروان‌کوژە ف ستارهٔ سحری.

**کارك:** ١) پێتاوی چەرمی خاو؛ ٢) کارژۆڵە؛ ٣) جێگەی دانەوێڵە کە لە قوڕی دەکەن، کەندوُ؛ ۴) نەگەیشتو، کار؛ ۵) باریکەرێ بۆ چوُنەناو باغچەی پەرژین‌کریاو ف ١) چارق؛ ٢) بزغاله؛ ٣) کندوی غلّه، انبار گلی غلّه؛ ۴) کال؛ ۵) راه باریك برای عبور در باغچه.

**کارك:** قارچ ف قارچ.

**کارکردن:** ١) خەبتین؛ ٢) بەهرەدانی دەرمان؛ ٣) ڕەوانی زگ ف ١) کارکردن؛ ٢) اثر بخشیدن دارو؛ ٣) اسهال.

**کارکردە:** ١) کاردیدە؛ ٢) شتی دەکارکراو ف ١) کارازموده؛ ٢) مستعمل.

**کارکرن:** ١) خۆسازو تەیار کردن؛ ٢) قازانج لە سەودا کردن ف ١) مُهیّا شدن؛ ٢) نفع بردن در معامله.

**کارکری:** ١) سازو ئامادە؛ ٢) قازانج کردو ف ١) مُهیّا و اماده؛ ٢) سود برده در معامله.

**کارکو:** ١) کاری بەهرەدەر؛ ٢) کارا ف ١) مؤثر، اثربخش؛ ٢) کارا، فعّال.

**کارکەتن:** کارتێ‌کەوتن، کارپێ‌بوُن ف کار آدم به دست کسی افتادن.

**کارکوشتە:** کارامە ف کارامد.

**کارکون:** دەرمانی ڕەوانی زگ ف داروی مسهل.

**کارکەر:** خەباتچی، شوُلکەر ف کارگر.

**کارکەنار:** هەڵپەسیراو لە کار، لەکار لادراو ف از کار برکنار شده.

**کارکەناری:** موُچەی‌هەڵپەسیراوی‌لەکار ف حقوق بازنشستگی.

**کارکەو:** راوەکەوی‌بەکۆمەڵ‌لەبەفردا ف شکار گروهی کبك.

**کارگ:** ١) قارچ؛ ٢) مریشك، مامر، کەڕگی ف ١) قارچ؛ ٢) مُرغ.

**کارگا:** جێگەی پیشەسازی ف کارگاه.

**کارگوزار:** سوُرباش ف کارگزار.

**کارگە:** کارگا ف کارگاه.

**کاڕگە:** مریشك، مامر ف مُرغ.

**کارگەچی:** پاڵەی کارخانە ف کارگر کارخانه.

**کارگەر:** کارکەر، پاڵە، خەباتکار ف کارگر.

**کارگەگولانە:** کارگی ژەهراوی کە ناخورێ ف قارچ سمّی.

**کارگەگولە:** کارگەگولانە ف قارچ سمّی.

**کاڕگی:** مریشك، مامر ف مُرغ.

**کارگێڕ:** کەسێ بەسەر کاروباری شوێنێ ڕادەگا، مدیر ف مدیر.

**کارلەکارترازان:** برێتی لە ڕوداوێك کە پاشگەزبوُنەوەی تیا نەبێ ف کار از کار گذشتن.

**کارم:** ١) کاری من، شوُلی من؛ ٢) دەتوانم: (**ئەز کارم ڤێ شوُلێ بکەم**)؛ ٣) کرم ف ١) کارمن؛ ٢) می‌توانم؛ ٣) کِرم.

**کارماخ:** سەرەند ف سرند، غربال درشت.

**کارمامز:** بەچکەئاسك ف بچه آهو.

**کارمدەکەوتش:** ١) کرمی تێ‌کەوتوە؛ ٢) برێتی لە تەمەڵی‌و بێکاری ف ١) کرموشده؛ ٢) کنایه از تنبلی و بیکارگی.

**کارمژن:** کرمێ، کرم‌تێ‌کەوتوُ ف کرمو.

**کارمسەرا:** جێگەی پشودانی قافڵە، کاروانسەرا ف کاروانسرا.

**کارمسەرادار:** خانچی ف کاروانسرادار.

**کارن:** ١) کاری ئێمە؛ ٢) دەتوانن ف ١) کار ما؛ ٢) می‌توانند.

**کارناس:** زانا لە کار، کارزان ف کارشناس.

**کارنامە:** پسوُلەی سیایی کارێ کە کراوە ف کارنامه.

**کارنیار:** داخوازی کار ف خواهان.

**کاروا:** جیوەی دارێکە زەردو سوُك‌و زۆر بەقیمەت ف کهربا.

**کاروان:** قافڵە ف کاروان.

**کارواناشی:** پیازاوی هێلکەتێکراو ف اشکنه.

**کاروانچی:** کەسێ کە دەگەڵ قافڵەیە ف کاروانی.

**کاروانسەرا:** کارمسەرا ف کاروانسرا.

**کاروانقڕان:** ئەستێرەکە، ئەستێرەی ڕۆژێ ف ستارهٔ سحری.

**کاروانکوژ:** ۱) کاروانقڕان؛ ۲) هەوێردە، مەلێکە ف ۱) ستاره سحری؛ ۲) پرنده‌ای است.
**کاروانکوژە:** کاروانقڕان ف ستارهٔ سحری.
**کاروانڤان:** سەرقافڵە، سەرۆکی کاروان ف ساربان.
**کاروانە:** ۱) باڵدارێکە بەقەد مریشکێك دەندووکی درێژە؛ ۲) هاتوچوّ لە یەك جێگـەدا؛ ۳) ژەنینی گان‌کردن؛ ۴) هەوایەکی گۆرانی‌یە ف ۱) پرنـدهٔ کاروانـك؛ ۲) آمـدوشد در یك جای معیّن؛ ۳) کفل جنباندن هنگام جماع؛ ۴) آهنگی است.
**کاروانەپێ‌کردن:** ژەنین لە کاتی گان کردندا ف کله‌زدن در جماع.
**کاروانی:** مرۆی ناو قافڵە ف کاروانی.
**کاڕوبا:** کاروا ف کهربا.
**کاروبار:** کار لە هەمو جۆرێك ف کاروبار.
**کاروخا:** ئامرازێکە لە دەزگای جوّلاییدا ف از ابزار بافندگی.
**کاروس:** گیایەکی بۆن‌خۆشە ڕەگەڵ پەنیر دەخرێ ف گیاهی است که با پنیر آمیخته می‌شود.
**کارۆس:** وتاری‌ئایینی، ئامۆژگاری‌دینی ف موعظه.
**کاڕوش:** ۱) گیایەکە لە گیای هەرزن دەکا؛ ۲) پەلکی شینی پیازو سیر بێ سەلك ف ۱) گیاهی است شبیه ارزن؛ ۲) ساقهٔ سبز پیاز و سیر.
**کاروك:** ۱) کارگ، قارچ، قارچـــك؛ ۲) پۆڵا، ئاسـنی‌بی‌خەوش ف ۱) قارچ؛ ۲) پولاد.
**کاروو:** کاروان، قافڵە، کارڤان ف کاروان.
**کارە:** ۱) کارت، کارتـــە، خێرۆك؛ ۲) کاراك؛ ۳) کاربـــەدەســـت: (هیچ‌کارەیە)؛ ۴) گـــوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف ۱) نگـا: خێرۆك؛ ۲) معـدن؛ ۳) کاره، کار به دست؛ ۴) نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.
**کاڕە:** دەنگی بەرزی پەزو بەرخ ف صدای میش و بره، بع.
**کارەب:** کاره با، جیوەی دارێکە دەکرێتە تەسبیح‌و... ف کهرُبا.
**کارەبا:** ۱) کاروا، کاروبا؛ ۲) بەرق، بروسکە ف ۱) کهربا؛ ۲) نیروی برق.
**کارەبایی:** ۱) زەردی ئاچخ‌و ڕۆشن، بەڕەنگی کارەبا؛ ۲) ئەسپابی بەرقی ف ۱) کهربایی رنگ؛ ۲) ابزار برقی.
**کارەڕەهات:** شەڕو جوێنی زۆر ف کنایه از دعوا و دشنام زیاد.
**کارەسات:** قەومان، بەسەرهاتی ناخۆش ف رویداد ناگوار.
**کارەك:** گندۆرە، کاڵەك ف خربزه.
**کارەکەر:** قەرەواش، قەرواش، جێری ف کلفت خانه.
**کارەکـــەرە:** کەسێ کە ئاتـــاجی ماڵ پێك دێنێ‌و بۆی مانـــدو دەبێ: (**کـــارەکـــەرەم** بمرێ مشۆر خۆرەم نەمرێ) ف کسی که برای خانه زحمت می‌کشد.
**کارەگا:** کارگا ف کارگاه.
**کارەمو:** تەنراو لە موی‌بزن ف تافته از موی بُز.
**کاڕەنگ:** زەردی ڕۆشن، بەڕەنگی کا ف زردِ کاهی.
**کارەوا:** کارەبا ف نگا: کارەبا.
**کارەوان:** شوانی کارژێلان ف بزغاله‌چران.
**کاری:** ۱) بەکـــار، ئازا لە کار؛ ۲) کاردوٚ؛ ۳) ئاڵات‌و زەردەچـــێوە؛ ۴) چاندراو: (**تەڕەکاری**)؛ ۵) گیایەکە لەدەم ئاو دەڕوێ‌وشیرەکەی ژەهرە ف ۱) فعّال، کاری؛ ۲) نگا: کاردوٚ؛ ۳) دیگ‌افزار؛ ۴) کاشته، کشت؛ ۵) گیاهی است سمّی.
**کاریتان:** ۱) پلورەمێش؛ ۲) عەمارەی‌دەخڵ؛ ۳) گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد ف ۱) کنـدوی عسل؛ ۲) انبار حبوبات؛ ۳) از روستاهای ویران‌شدهٔ کردستان توسط بعثیان.
**کاریتە:** شاتیر، دیرەك ف بالار.
**کاریتەپشت:** مۆغەرەی‌پشت، مرۆخەی‌پشت ف ستون فقرات.
**کاریچ:** ۱) شەنە، شەن؛ ۲) ناوچەیەکە لەکوردستان ف ۱) افشون؛ ۲) ناحیه‌ای در کردستان.
**کاری‌خێر:** ۱) شوٚلی باش‌و خواپەسند؛ ۲) برێتی لە گانی حەڵاڵ‌و ڕەوا؛ ۳) برێتی لە زەماوەن ف ۱) کارخیر؛ ۲) کنایه از جماع زن و شوی؛ ۳) کنایه از عروسی.
**کارێز:** ۱) ئاوێ کە لە بن زەویەوە دەرهێنراوەو داپۆشراوە؛ ۲) ناوچەیەکە لە کوردستـان؛ ۳) گونـدێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف ۱) کهریز، قنات؛ ۲) ناحیه‌ای در کردستان؛ ۳) نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.
**کارێزکەن:** کەسێ کە کاری کارێزلێدان دەکا ف مُقَنّی.
**کارێز لێدان:** کارێز ئیجاد کردن ف کهریز زدن.
**کارێزاو:** ۱) ئاوێ کە لە کارێزەوە دێت؛ ۲) برێتی لە ئاوی فێنك‌و سوٚك ف ۱) آب کهریز؛ ۲) کنایه از آب خنك و گوارا.
**کارێزە:** ۱) کـارێز؛ ۲) گونـدێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف ۱) کهریز؛ ۲) نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.
**کاڕێژ:** ۱) قولی سەربـانی کادان کە لەوێوە کا دەڕێژنە ناو کادانەوە؛ ۲) کاڕاژ؛ ۳) چەمـســەری شەویلاکە؛ ۴) شەنە، شەن ف ۱) سوراخ بام کاهدان برای ریختن کاه؛ ۲) گاراژ؛ ۳) مفصل آرواره ها؛ ۴) افشون.
**کاریس:** کاروش، کاروس ف گیاهی است.
**کاریگەر:** کاری، بەتاسیر ف کاری، اثر بخش.
**کاریلە:** کارژۆڵە ف کهر، بزغاله.
**کارین:** توانین، تاقەت هێنان ف توانستن، تاب آوردن.
**کارینای:** دەکارکریاگ، کوٚن‌بوگ ف کارکرده، مُستعمل.
**کارێ‌هەبێ:** عەمباری دەغڵ ف سیلو.
**کارێ‌هەنگان:** پلوٚرەی هەنگ ف کندو.
**کاز:** قوٚختە ف کوخ، خانهٔ محقّر.
**کازتین:** هەراو هاوار ف داد و فریاد.
**کازکـاز:** ۱) ناڵانـدن؛ ۲) دەردی‌دڵ کردن؛ ۳) لوٚرە ف ۱) نالیدن؛ ۲) درددل کردن؛ ۳) زوزه.
**کازکازە:** هەوای گۆرانی‌و قام‌و لاوکی زۆرخۆش ف ترانهٔ شاد.
**کازوکوٚز:** بوٚلێلەی بەیان، کازیوە: (**کازوکوٚزی بەیانی**) ف سپیده‌دم، فجر کاذب.

**کرده:** ۱) کردار؛ ۲) خاراو له کار؛ ۳) کاری کراو؛ (**کـرده** پەشیمان بی نەك نەکرده پەشیمان) «مەسەل» ف ۱) کردار؛ ۲) کارامد؛ ۳) عمل شده.

**کردەوە:** کردار ف کردار.

**کرژ:** ۱) بەنی توندبادراو؛ ۲) قرچاو؛ ۳) چوستو چالاك؛ ۴) موی لێك هالاوی سەر. قرژ ف ۱) رشتهٔ خوب تابیده؛ ۲) ترنجیده، چروکیده؛ ۳) چالاك؛ ۴) موی فرفری شده.

**کرژبـوُن:** ۱) توند باوخواردنی گشتەك؛ ۲) وێكهاتن؛ ۳) توُرەبوُن؛ ۴) لێكهالانی موی سەر ف ۱) زیادتاب خوردن رشته؛ ۲) چروك شدن؛ ۳) خشمگین شدن؛ ۴) فرفری شدن مو.

**کرژکـردن:** ۱) زۆربـادانی گشتەك؛ ۲) تێکەڵاوکردنی توُکەسەر ف ۱) بسیار تاب دادن رشته؛ ۲) فرفری کردن مو.

**کرژنگ:** قرژانگ ف خرچنگ.

**کرژە:** ۱) مرۆی چوستو چالاك؛ ۲) گونـدێکـه له کوردستان بەعسی وێرانی کرد ف ۱) آدم چالاك و آمـاده؛ ۲) از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**کرژەڵە:** گیایەکه به زۆرتاڵ بەناوبانگه، کەکره ف گیاهی است سَنبل تلخی.

**کرژهەڵاتن:** کرژبوُن ف نگا: کرژبوُن.

**کرژی:** ۱)چـونیەتی کرژ؛ ۲) بەڵەکی، بەڵەك بوُنی پێست ف ۱) کیفیّت «کرژ»؛ ۲) بَرَص.

**کرس:** زبلّو زالّ ف آت و آشغال.

**کرسپ:** کەرەوز، جۆرێکه له سەوزیجات ف کرفس.

**کرش:** ۱) عوُر، ورگ؛ ۲) پوُش و چیلکه ف ۱) شکمبه؛ ۲) خس و گیاه.

**کرّش:** ۱) شیشی پۆتێخستنو کوتـان له تەوندا؛ ۲) راگوێزانی شت، گۆزانەوه ف ۱) از ابزار بافندگی؛ ۲) نقل و انتقال اشیاء.

**کرّش‌تش:** ۱) مالگوازتنـەوه؛ ۲) ئەسپـابراگوێزان ف ۱) نقـل مکان کردن؛ ۲) نقل و انتقال وسایل.

**کرش‌وگلیش:** چیلکەو چالّ، پوُش‌و پەڵاش ف خس و خاشاك.

**کرشـه:** ۱) کلۆش، قرچـه؛ ۲) جانـەوەری زگـدەرپـەڕیو؛ ۳) کوتکی هەرەزلی دەستی ئاسنگەر ف ۱) ساقهٔ غلّه؛ ۲) شکم گنده؛ ۳) پُتك آهنگری.

**کرك:** ۱) دەشتی زۆر پانو بەرین؛ ۲) تیغەرەپشت ف ۱) هامون، جلگهٔ هموار؛ ۲) ستون فقرات.

**کرّك:** ۱) جانـەوەری دورەگه؛ ۲) شکیاوی پێشـەی لەش ف ۱) جانور دورگه؛ ۲) شکسته استخوان.

**کرّك:** ۱) وێكهاتوی بەلەرزه؛ ۲) مریشکی کڕ ف ۱) متشنّج؛ ۲) مرغ کرچ.

**کرّکاك:** تەیرێکه ف پرنده‌ایست.

**کرکای کرك:** دەشتی کاکی بەکاکی ف جلگه و بیابان.

**کرّکـــردن:** ۱) بێدەنـگ کردن؛ ۲) خۆمـاتدان؛ ۳) برێتی له کوشتنی کەسێ ف ۱) بی‌صدانمودن؛ ۲) کزکردن؛ ۳) کنایه از کشتن کسی.

**کرّکرّاگه:** ۱) سورێنچکه؛ ۲) کونی گوێ؛ ۳) ئێسکی ناسکی کرۆشتەنی ف ۱) سرخنای؛ ۲) سوراخ گوش؛ ۳) غضروف.

**کرّکرّانه:** کرّکرّاگه ف نگا: کرّکرّاگه.

**کرکرتوّکه:** کرّکرّاگه، ئێسکی ناسك ف غضروف.

**کرّکرّك:** کرّکرّاگه ف نگا: کرّکرّاگه.

**کرّکرّگ:** کرّکرّاگه ف نگا: کرّکرّاگه.

**کرّکـرّوك:** ۱) گیایەکـه وەك کەلەم دەچێ؛ ۲) سێوەبن‌عەرزیله ف ۱) گیاهی است شبیه کلم؛ ۲) سیب زمینی استانبولی.

**کرکروّکه:** کروّچەنه ف غضروف.

**کرّکرّه:** ۱) کرّکرّاگه؛ ۲) قرقرّه، غەرّغەرّه؛ ۳) جوّریّ تریّ سپیلکه ف ۱) نگا: کرّکرّاگه؛ ۲) قرقرهٔ نخ‌پیچ؛ ۳) نوعی انگور.

**کرکلاش:** ۱) خوروُ؛ ۲) خوراندن به نینوّك ف ۱) خارش؛ ۲) خاراندن.

**کرکه:** کورکه ف نگا: کورکه.

**کرّکەفتن:** لەسەر هێلکان خەوتنی مریشك ف کرچ خوابیدن مُرغ.

**کرّکەفته:** لەسەر هێلکان خەفتگ ف مُرغ کرچ خوابیده.

**کرّکەوتن:** کرّکەفتن ف کرچ خوابیدن مُرغ.

**کرّکەوتو:** کرّکەفته ف مُرغ کرچ خوابیده.

**کرّکەوته:** کرّکەفته ف مُرغ کرچ خوابیده.

**کرّکی:** وەستای شکستەبەند ف اُستاد شکسته‌بندی.

**کرگار:** ۱) پیشه؛ ۲) کردار ف ۱) صنعت؛ ۲) کردار، روش.

**کرم:** ۱) جانـەوەری خزوّکی یجوُك که له ناو میوەو گلّو گوّشتی گەنی پەیدا دەبیّ؛ ۲) دەنگی داکروّشتن ف ۱) کرم؛ ۲) صدای خاییدن.

**کرماج:** ۱) ناوه بوّ گەلی کورد؛ ۲) ناوه بوّ دێهاتی؛ ۳) بەشێکی هەره زوّر له کورد ف ۱) کُرد؛ ۲) دهاتی؛ ۳) قسمت اعظم کُرد.

**کرماشان:** گوّردراوی کرماجان. ناوی شارێکه ف نام شهری است، کرماشان.

**کرمـان:** ۱) به ددان کروّشتن؛ ۲) سوُکـەڵەناوی کرماج ف ۱) خایش، خُردشدن با دندان؛ ۲) مخفّف «کرماج».

**کرمانج:** کرماج ف نگا: کرماج.

**کرمانجی:** شێوەئاخافتنی کوردی کرماج ف گویش «کرماج».

**کرماندن:** داکروّژتن ف کلوجیدن، با دندان خرد کردن.

**کرمانشا:** سوُکەڵەناوی کرمانج‌شار یان کرماجان ف مخفّف «کرمانج شار».

**کرمانن:** کرماندن ف نگا: کرماندن.

**کرماوی:** شتێ که کرمی تێدا بێ ف کرمو.

**کرم‌تیّ‌دان:** کرماوی بوُن ف کرموشدن.

**کرم‌تیّ‌کەوتن:** کرماوی بوُن ف کرموشدن.

**کرّمچین:** قرّمچین ف نگا: قرّمچین.

**کرمخواردو:** کرماوی ف کرم خورده.

**کرمژن:** دەنگی داکروّژتن ف صدای کلوجیدن.

**کرمژنه:** کرماوی ف کرمو.

**کرّمشین:** قرّمچین ف نگا: قرّمچین.

**کرمکار:** بریتی لە کەسێ کە زۆر بە کارەوە خەریکە ف کنایه از بسیار کارا.

**کرمکوژه:** گیایەکە دەرمانی کرم ف گیاهی است داروی کرم شکم.

**کرمکـه:** ۱) خشڵێکی ژنـانـە لە چەشنی کرمی پاڵپێکەوەدراو دروست کراوە؛ ۲) نەخشێکـە لە چیغی چادری دەکـەن ف ۱) از زیورآلات زنانه؛ ۲) نقشی بر چیغ سیاه چادر.

**کرمکیز:** ژانەزگ لە کرمەوە ف درد ناشی از کرمِ شکم.

**کرمن:** کرماوی ف کرم‌زده.

**کرموزی:** مژو تەمی زۆر ف مه غلیظ.

**کرموژن:** کرماوی ف کرم‌زده.

**کرمۆس:** لەپڕ، لەنکاو ف ناگهانی.

**کرمـۆکـه:** ۱) خشڵێکی ژنـانـە، کرمکـە؛ ۲) کرمی چکۆلە ف ۱) از زیورآلات زنانه؛ ۲) کرمِ ریز.

**کرمۆڵ:** کرم‌تێ‌کەوتو، کرماوی ف کرمو.

**کرمه:** ۱) دەنگی داکرۆژتن، کرم؛ ۲) داروکێکە لە ئامۆردا ف ۱) صدای کلوجیدن؛ ۲) چوبکی در خیش.

**کرمەچۆلێ:** کڕکڕە، ئێسکی کرۆشتەنی ف غضروف.

**کرمەرێز:** کرم‌تێ‌کەوتو، بۆ لەش و برین دەگوترێ ف کرمو، برای گوشت کرم‌زده گویند.

**کرمەژن:** کرموژن، کرماوی ف کرمو، کرم‌زده.

**کرمەژنه:** کرماوی ف کرم‌زده.

**کرمەژەن:** کرماوی ف کرم‌زده.

**کرمەژەنه:** کرماوی ف کرم‌زده.

**کرمەسوورکه:** کرمێکە لەبن خاکی شەداردا دەژی بۆ دەرمان دەشێ ف خراتین، کرم خاکی.

**کرمەسووره:** کرمەسوورکە ف نگا: کرمەسوورکە.

**کرمەك:** ۱) خشڵی ژنانە، کرمکە، کرمك؛ ۲) زوانەی ناو ئاڵقە ف ۱) از زیورآلات زنانه؛ ۲) زبانه.

**کرمه کرم:** دەنگی داکرمینی زۆر ف صدای خاییدن بسیار.

**کرمی:** کرماوی ف کرم‌زده.

**کرمێ:** کرماوی ف کرم‌زده.

**کرمی‌ئاوریشم:** کرمێکە لیکاوەکەی دەبێتە هەودای ئاوریشم ف کرمِ ابریشم.

**کرمیت:** کبریت، شەمچە، شخاتە، شقارتە، شقاڵتە ف کبریت.

**کرمی گڵ:** ۱) کرمـەسوورکە؛ ۲) بریتی لە کەسێ زۆر خەریکی کشت و کاڵە ف ۱) خراتین، کرم خاکی؛ ۲) کنایه از کشاورز بسیار پُرکار.

**کرمی گڵی:** کرمی گڵ ف نگا: کرمی گڵ.

**کرن:** کردن ف کردن.

**کرناس:** ئاوڵاوی ف آبله‌گون.

**کرنگ:** زۆم، نۆبە، هۆبە ف گروه چادرنشینان دورهم در ییلاق.

**کرنگ:** ۱) قرنو؛ ۲) گیای گەرچەك ف ۱) قراد؛ ۲) گیاه کرچك.

**کرنو:** قرنو ف قراد.

**کرنوش:** خۆ بوچکەوکردن بەلای کەسێکەوە ف کُرنش.

**کرنی:** قرنو ف قراد.

**کرواس:** ۱) کرێ لە لۆکە کە جوڵا دەیکا، جاو، جانگ؛ ۲) کراس ف ۱) کرباس؛ ۲) پیراهن.

**کروت:** جۆرێ هەمرو، تەحرێ هەرمێ ف نوعی گُلابی.

**کروتن:** داکروژتن ف کلوجیدن، با دندان خرد کردن.

**کروچ:** ۱) دەفـری لێوشکـاو: (گلێنەکە کروچ بوە)؛ ۲) سواوی کۆن: (کەچو کروچ بوە) ف ۱) ظرف لب‌شکسته؛ ۲) فرسوده.

**کروچەنه:** کرکروکە ف غضروف.

**کرور:** ۱) پێنسەدهەزار؛ ۲) کلۆر، ناوخاڵی ف ۱) کرور؛ ۲) توخالی.

**کروز:** ناوەرۆك کۆڵین، ناوهێنانەدەر لە قاپیلك ف مغزدانه بیرون آوردن.

**کرۆز:** ۱) ساوپاوی کۆن؛ ۲) سوتانی پێشەو موو؛ ۳) پیری پەك‌کەوتە؛ ۴) ناوڵاوی، رۆزە؛ ۵) دەنگی گریانی لەسەرخۆ؛ ۶) پاڕانەوەی زەلیلانە ف ۱) فرسوده و کهنه؛ ۲) سوختن استخوان و موی؛ ۳) پیرِ ازکار افتاده؛ ۴) آبله‌گون؛ ۵) صدای گریهٔ آهسته؛ ۶) لابه.

**کرۆزان:** ۱) سوتـانی ئێسـك و موو؛ ۲) پاڕانـەوەی بەنیوە گریانـەوە؛ ۳) تۆزیانەوەی پێست ف ۱) سوختن استخوان و مو؛ ۲) لابه و زاری؛ ۳) احساس سوزش در پوست.

**کرۆزانـدن:** ۱) سوتاندنی ئێسك و موو؛ ۲) بریتی لە لەبەین‌بردن ف ۱) سوزانیدن استخوان و مو؛ ۲) کنایه از ساقط کردن از هستی.

**کرۆزانن:** کرۆزاندن ف نگا: کرۆزاندن.

**کرۆزانەوه:** ۱) پاڕانەوەی زەلیلانە؛ ۲) تۆزانەوە، چۆزانەوە: (هەمو لەشم دەکرۆزێتەوە) ف ۱) لابه و زاری؛ ۲) سوزش در پوست.

**کروزرو:** گیایەکە ف گیاهی است.

**کرۆزه:** کرۆز ف نگا: کرۆز.

**کرۆزه کرۆز:** کرۆزی زۆر ف «کرۆز» پیاپی.

**کرۆزیانەوه:** کرۆزانەوە ف نگا: کرۆزانەوە.

**کروژتن:** کروتن، داکروژتن ف کلوجیدن، با دندان خردکردن.

**کروژنه:** کڕکڕاکە، ئێسکی ناسکی کرۆشتنی ف غضروف.

**کروژه:** کروژنە ف غضروف.

**کروژەله:** کروژنە ف غضروف.

**کروژین:** کروتن ف کلوجیدن.

**کرۆس:** رووتـەوەبـوون بە ددان، کڕانـەوە: (ئێسکی کرۆست، کەروێشـك دارەکانی کرۆستەوە) ف لخت شدن چیزی مانند استخوان یا درخت به وسیلهٔ دندان.

**کرۆسان:** کرۆس ف نگا: کرۆس.

**کرۆساندن:** کڕاندنەوە بە ددان ف لخت کردن استخوان یا پوستهٔ چیزی با دندان.

**کرۆساندنەوه:** کرۆساندن ف نگا: کرۆساندن.

**کرۆسانەوه:** کرۆسان، کرۆس ف نگا: کرۆس.

**کرۆساوه:** رووت‌کراگ بە ددان ف لخت شده با دندان.

**کرۆسك:** ۱) هەرمێ کێویلە؛ ۲) تیخەڵەی کرۆز ف ۱) گلابی وحشی؛ ۲)

تیغ زنگارزده.

**کڕۆسین:** کڕۆسان ف نگا: کڕۆسان.

**کڕۆسینەوە:** کڕۆساندنەوە ف نگا: کڕۆساندنەوە.

**کڕۆسینەوە:** کڕۆساندنەوە ف نگا: کڕۆساندنەوە.

**کڕۆسینەوە:** جانەوەرێ کە دەکڕۆسێنێتەوە ف لخت کننده با دندان.

**کرۆشتن:** کروتن ف کلوجیدن، خردکردن با دندان.

**کرۆشمە:** خۆکزکردن و مات‌دانیشتن ف کزکردن و در گوشه‌ای نشستن.

**کروڤە:** بەفری بەباوە، کرێوە، کرێڤە ف کولاك.

**کرۆك:** کارتێ کەر، وشەیەکی ڕێزمانە بۆشتێ کەکار دەکا ف فاعل جمله.

**کروکس:** هەرمێ کرۆسك ف گلابی خودرو.

**کرۆنتش:** کرانتش ف نگا: کرانتش.

**کروێ:** گرێی هەڵتوقیو لە دارا ف گره تنهٔ درخت.

**کرویت:** کرمیت، شەمچە، شخاتە، شقارتە، کبریت ف کبریت.

**کڕە:** ١) دەنگی جیڕەی بەقەوەت: (کڕەی ددانی دێت)؛ ٢) دەستاڕ؛ ٣) ئاسیاوی چەڵتوك و پەڕش لێکردن؛ ٤) دەنگی خاکی ڕەق لە کاتی کێڵانی زەوی تەڕدا: (گاسن کڕە دەکا)؛ ٥) برێتی لە سپاس؛ ٦) خەریك بەکار؛ ٧) بزیشکی برینگەر ف ١) صدای بهم ساییدن چوب یا استخوان؛ ٢) دستاس؛ ٣) آسیاب ویژهٔ شالی کوبی؛ ٤) صدای خاك سفت که با گاواهن برخورد می‌کند؛ ٥) کنایه از سپاس؛ ٦) سرگرم کار؛ ٧) جرّاح.

**کڕەك:** نەجوڵ، بێ‌جوڵە، بەرانبەر بە زیندەوەرو ڕووەك ف جماد.

**کڕەکڕ:** ١) دەنگی داکرۆژتن؛ ٢) خرتەخرتی کروسینەوە ف ١) صدای خاییدن؛ ٢) صدای استخوان گاززدن.

**کڕەکردن:** ١) پەڕش و چەڵتوك لە ئاسیاوی کڕە هاڕین؛ ٢) برێتی لە منەت‌کێشان، سپاس‌کردن ف ١) شالی را به آسیاب ویژه بردن؛ ٢) کنایه از ممنون بودن.

**کڕەیدی:** کورتەی بێژە، پوختەی وتار ف خلاصهٔ کلام.

**کرێ:** ١) حەقی کار؛ ٢) کرا، ئیجارە؛ ٣) ڕۆژی یەك‌شەمە کە بازاڕی دیهاتی هەیە ف ١) مزد؛ ٢) اجاره، کرایه؛ ٣) یکشنبه‌بازار.

**کڕێ:** ١) ئارامی؛ ٢) بێدەنگی؛ ٣) کڕکەوتنی مریشك؛ ٤) سەندی ف ١) آرامش؛ ٢) خاموشی؛ ٣) کرچی مرغ؛ ٤) خرید (سوم شخص مفرد).

**کری:** ١) کردو؛ ٢) کرێ ف ١) عمل شده؛ ٢) نگا: کرێ.

**کریا:** کرا، جێ‌بەجێ بو ف انجام شد.

**کڕیا:** سەنرا، کڕدرا ف خریده شد.

**کریار:** کردە، کردار، ڕەوشت، ئاکار، خدە ف اعمال و رفتار.

**کڕیار:** کەسێ شت ئەسەنێ ف خریدار.

**کڕیاگ:** کڕدراو، سەنراو ف خریداری شده.

**کڕیان:** ١) سەنن؛ ٢) سەندیان ف ١) خریدن؛ ٢) خریدند.

**کریان:** کران، کردن ف کردن.

**کڕیانەوە:** دوای فرۆش دیسان کڕینی فرۆشیاو ف بازخرید.

**کریانەوە:** ١) ئاواڵەبوُنی درگای داخراو؛ ٢) ڕایی‌بوُنی گرێ ف ١) بازشدن دربسته؛ ٢) بازشدن گره.

**کرێب:** ١) خەم و خەفەت؛ ٢) زەوینێ کە دوساڵ جاریێ دەکێڵدرێ؛ ٣) زەمینی یەك‌دەفعە گاسن‌لێدراو ف ١) اندوه؛ ٢) زمینی که دوسال یکبار کشت شود؛ ٣) زمین یك بار شخم شده.

**کرێبا:** ١) جیرانەزەوی؛ ٢) هاوماڵی دی ف ١) همسایه در کشاورزی؛ ٢) اهل ده نسبت به یکدیگر.

**کرێبار:** حەقی باربۆهەڵگرتن ف کرایهٔ حمل بار.

**کریبار:** کرێبار ف کرایهٔ حمل بار.

**کرێت:** ١) بێ‌بەش لە جوانی؛ ٢) کاری پیس و خراپ؛ ٣) سندە گڵ ف ١) بدگل؛ ٢) کار زشت؛ ٣) کلوخ.

**کرێج:** ١) سواڵەت، قوڕی سوُرەوەکراو ف سفال.

**کرێچی:** ١) دەفری سواڵەت؛ ٢) کرایەنشین ف ١) سفالین؛ ٢) کرایەنشین.

**کرێدار:** کەرانشین ف مُستأجر.

**کرێداسی:** هەقەباڵە ف مزد درویدن.

**کریزەنتێن:** گوڵێکی دەشتی زۆر خوشیکە. *بەزاراوەی دیاربەکر پێی‌دەڵێن پات* ف گُلی است.

**کرێژ:** ١) شانەی وشکی هەنگوین؛ ٢) شتێ کە بە چنگ‌لێدان لە سەری چڵکن و کەچەڵ دادەوەرێ، قرێژ؛ ٣) قەوزەی بەرد؛ ٤) چڵك، پیسی ف ١) شانهٔ خشکیدهٔ عسل؛ ٢) سبوسهٔ سر، شوره؛ ٣) گل سنگ؛ ٤) چرك، کثافت.

**کرێژاو:** ١) سەربەکرێژ؛ ٢) چڵکن ف ١)دارای شورهٔ سر؛ ٢) چرکین.

**کرێژاوی:** کرێژاو ف نگا: کرێژاو.

**کریژۆك:** ژوُرەوەی کونی گوێچکە ف صُماخ گوش.

**کرێژەبەرد:** قەوزەی سەر بەرد ف گل سنگ.

**کریژیۆك:** کریژۆك ف صُماخ گوش.

**کریس:** ١) وشەی بانگ‌لێ‌کردنی کارژۆڵە؛ ٢) پزیسکی ئاگر ف ١) کلمه‌ای برای صداکردن بزغاله؛ ٢) شرارهٔ آتش.

**کریسك:** پزیسکی ئاگر ف شراره.

**کریسکە:** کریسك ف شراره.

**کریسە:** وتەی بانگ‌کردنی کارژۆڵە ف کلمه‌ای برای صدا کردن بزغاله.

**کرێش:** کرێژ ف نگا: کرێژ.

**کرێشە:** جۆرێ کاڵای گەزی ف نوعی پارچه.

**کرێشەیش:** ١) ڕاکێشان بە زەمیندا؛ ٢) دەرکێشان؛ ٣) گوێزانەوە؛ ٤) سەنگاندن ف ١) برزمین کشیدن؛ ٢) بیرون کشیدن؛ ٣) نقل مکان کردن؛ ٤) نگا: سەنگاندن.

**کریفۆك:** شەمەتریلکە ف زنبور عسل وحشی.

**کریف:** ١) خزم؛ ٢) دۆست؛ ٣) کەسێ کە منداڵ لە باوەشیا خەتەنە کراوە ف ١) خویش؛ ٢) آشنا؛ ٣) شخصی که کودك را در بغلش ختنه کرده‌اند.

**کرێڤ:** کریف ف نگا: کریف.

**کرێڤە:** بەفری بەباوە ف کولاك.

**کرێکار:** کەسێ کە لە بەرانبەر کرادا کار دەکا ف کارگر روزمُزد.
**کرێکی:** جاش و جانوُی دوبڕ ف کُرّە اسب و کُرّە خر تازە دوبهار دیده.
**کرێگرتە:** ۱) کرانشین؛ ۲) خانوێ کە بە کراهە دەدرێ ف ۱) اجارەنشین؛ ۲) خانۀ اجارەای.
**کرێڵ:** ۱) گوێ کپ؛ ۲) کراڵ، قاقڕ ف ۱) کر، ناشنوا؛ ۲) زمین بی گیاه.
**کڕین:** سەنن ف خریدن.
**کڕێن:** ۱) کراڵ؛ ۲) تم‌تمان ف ۱) زمین بی‌گیاه؛ ۲) زمین سنگی.
**کرینچك:** پەرچوُکەی لەسەر هەنی قرتاو، قشت ف کاکل بر پیشانی قیچی شده.
**کڕینۆخ:** کڕیار، ئەوی شت دەکڕێ ف خریدار.
**کڕێنەوە:** جانەوەرێ کە شت دەکرۆسێنێتەوە ف نگا: کرۆسێنەوە.
**کڕینەوە:** ۱) لەپاش فرۆش سەندنەوە؛ ۲) برێتی لە ڕزگارکردن لە چۆرتم ف ۱) بازخرید؛ ۲) کنایه از نجات دادن.
**کریو:** کریف ف نگا: کریف.
**کڕێوکڕێو:** باڵداریکە ف پرندەایست.
**کڕێوە:** کڕیفە، بەفر و با پێکەوە ف کولاك.
**کڕێوەبردو:** برێتی لە کەسێ کە زۆر بە سەرما قەڵسە ف کنایه از کسی کە طاقت سرما ندارد.
**کڕێوەپێچ:** گیانداریێ کە لە ترسی کڕێوە پەنا بۆ هەمو ئەنوایەك دەبا ف جانوری کە از ترس کولاك بە هرجا پناه می‌برد.
**کڕێوە کردن:** بەفر و با هاتن ف کولاك کردن.
**کریە:** ۱) یەکشەمە کە رۆژی بازاڕە؛ ۲) کردویە ف ۱) یکشنبه‌بازار؛ ۲) کرده است.
**کڕی هەرێ:** جاش، بەچکەکەر، هوڵی‌کەر، دەحشك ف کُرّەخر.
**کز:** ۱) ژاکاو؛ ۲) داڵگۆشت؛ ۳) گڕی کەمی چراو ئاگر؛ ۴) سقك؛ ۵) دەنگی قرچانی دوگ و بەز لەسەر ئاگر؛ ۶) ژانی پێست و برین، چوُزانەوە؛ ۷) نازەواجی؛ ۸) باش نەدیتنی چاو؛ ۹) کونەمێرو؛ ۱۰) شارەمێرو ف ۱) افسرده؛ ۲) لاغر؛ ۳) شعلۀ اندك؛ ۴) سبك؛ ۵) صدای چز؛ ۶) سوزش پوست و زخم؛ ۷) کسادی؛ ۸) کم‌سویی چشم؛ ۹) سوراخ مورچه؛ ۱۰) شهر مورچگان.
**کزاف:** پاڕانەوە، لالانەوە ف تضرُع.
**کزان:** ۱) چوُزانەوە؛ ۲) چزان لەسەر ئاگر ف ۱) سورش پوست؛ ۲) جزبرآتش.
**کزاندنەوە:** کزان ف نگا: کزان.
**کزانن:** ۱) کزاندنەوە؛ ۲) دەڕۆندا قرچاندنی دوگ و بەز ف ۱) نگا: کزان؛ ۲) سرخ کردن دُنبه.
**کزانەوە:** کزان ف نگا: کزان.
**کزبوُن:** ۱) داڵگۆشت بوُن؛ ۲) کەم‌کردن ف ۱) لاغرشدن؛ ۲) کم شدن، کاستن.
**کزبەلۆك:** کزبلۆك، چاڤرەشۆك ف نگا: کزبلۆك.
**کزخ:** پەرتاوتنی دار ف هرس درخت.
**کزخان:** پەرتاوتنی دار ف هرس کردن.
**کزخاندن:** کزخان ف هرس کردن.
**کزر:** پندر، نیوەوشك ف نیم‌خشك.
**کزران:** ۱) زەمینێ کە درەنگ ئاو دەمژێ، شۆنە؛ ۲) سوُتانی مو ف ۱) زمینی کە دیرآب در آن نفوذ کند؛ ۲) سوختن موی.
**کزراندن:** ۱) سوُزاندنی مو؛ ۲) پروژاندنی گوڵەگەنمی فەریك ف ۱) سوزانیدن موی؛ ۲) از هم بازکردن خوشه گندم کال.
**کزربوُن:** ۱) پنر بوُنەوەی زەمینی قوڕ؛ ۲) برێتی لە پێگەیشتن و بەخۆداهاتن ف ۱) نیم‌خشك شدن زمین لجنی؛ ۲) کنایه از شکوفایی و رسایی.
**کزربوُنەوە:** نیوەوشك‌بوُن لە پاش تەڕی ف نیم‌خشك شدن بعد از خیسی.
**کزری:** ۱) نیوەوشك‌بوُن، پنری؛ ۲) سوتاوی‌خوری؛ ۳) هەڵێنجانی ئاو لە جێگەی قوُڵەوە ف ۱) نیم خشکی؛ ۲) سوزاندن پشم؛ ۳) بیرون کشیدن آب از عمق.
**کزك:** جزیلك ف جزغاله.
**کزکردن:** ۱) بڵێسە کەم‌کردن: (چراکە **کزکە**، ئاگرەکە **کزکە**)؛ ۲) بێدەنگ و فەقیرۆکە ڕۆنیشتن ف ۱) پایین آوردن شعله؛ ۲) درگوشه‌ای کز کردن.
**کزکردوُ:** کەسێ کە بە فەقیرۆکەیی خۆی لە سوُچێ خزاندوە ف کز کرده.
**کزکۆڵە:** کزو مات دانیشتوُ لە سوُچێ ف کز کرده.
**کزکە:** ۱) کزکۆڵە؛ ۲) نان لە بەڕو ف ۱) کزکرده؛ ۲) نان از آرد بلوط.
**کزگرین:** لەرزین لەبەر تاو، نۆبەتێ ف تب و لرز.
**کزمك:** ۱) سەرکۆتەڵ، سەرکوێزر؛ ۲) بنزیل، بن‌بێژنگی بێ کەڵك ف ۱) درشتۀ کوزر؛ ۲) تەنشین غربال.
**کزن:** ۱) دانەوێڵەیەکە بژیوە دەی‌چێنن گای پێ قەڵەو دەبێ؛ ۲) باکێشی تەندوُر، گولوێنە، گوڵبێنە؛ ۳) گارس، هەرزنەگەورە ف ۱) کرسنه، یکی از حبوبات؛ ۲) بادکش تنور؛ ۳) ارزن درشت.
**کزوت:** جلەبوُك ف لباس عروسی.
**کزوُری:** خوری سوتاو ف پشم سوخته.
**کزولکە:** فەقیرۆکە، کزکۆڵە ف کزکردۀ بیچاره.
**کزوُلە:** کزولکە ف کزکرده.
**کزونیر:** ئەداو ئەتوار لە ژن ف غمزه و ناز.
**کزە:** ۱) شنە، سروە، بای بسکان: (**کزەبایەکی هات**)؛ ۲) دەنگی داغ‌کردن: (**کزە لە جەرگمەوە هات**)؛ ۳) دەنگی چزەچز ف ۱) ایاز، نسیم؛ ۲) صدای داغ گذاشتن بر گوشت؛ ۳) صدای برشتن گوشت سرخ شده در تابه.
**کزەبا:** سروە، شنە ف نسیم.
**کزەلۆك:** کزولکە، کزکۆڵە ف کزکرده.
**کزەنە:** بۆنی موی پڕوزاو ف بوی موی سوخته.
**کزەی با:** دەنگی ناسکی سروە: (چڕین سەختم، چەڵ سەختی گوڵی من/کزەی دڵ وەك **کزەی با** دێتە بەرگوێت) «هەژار» ف صدای آرام نسیم.

**کزەی جەرگ:** برێتی لە زۆر خۆشەویست ف کنایە از بسیار محبوب.

**کزەی جەرگان:** ۱) کزەی جەرگ؛ ۲) برێتی لە دڵبەر، گراوی، ماشقە ف ۱) کنایە از محبوب؛ ۲) کنایە از معشوق.

**کزی:** ۱) سەرکـزی، کزکـردوُیی؛ ۲) لاوازی، داڵگـوٚشتی ف ۱) افسردگی؛ ۲) لاغری.

**کزیان:** ۱) لەسـەر ئاگر چزان؛ ۲) ژانو سوُزیانـەوەی پێست ف ۱) برآتش سرخ شدن؛ ۲) سوزش پوست.

**کزیانەوە:** سوُزیانەوە، چوُزانەوە ف سوزش پوست.

**کزیر:** ۱) بەردەستی پێشکار لە دێدا؛ ۲) دەلاّلی بازاڕو جاڕچی ف ۱) پاکار ارباب؛ ۲) جارچی و دلاّل.

**کزین:** جوٚرێ توٚپی گەمە ف نوعی توپ بازی.

**کزێنکە:** شلکێنەی لەرزۆندا سوُرەوەکراو ف خمیر آبکی سرخ شده در روغن.

**کزیە:** نێسکی سمتو کەفەڵ ف استخوان لگن.

**کژ:** ۱) خاوی بانـەدراو؛ ۲) جەنگـە؛ ۳) فەسڵی ساڵ؛ ۴) پشمە ف ۱) ریس تاب نخورده، خام؛ ۲) موسم؛ ۳) فصل سال؛ ۴) عطسه.

**کژبلوٚك:** گیایەکە بنکەکەی دەخورێ ف گیاهی است با پیازهٔ خوردنی.

**کژبیایش:** بەشلیوسستیڕوٚیشتن ف سلانەسلانه.

**کژژ:** ۱) دەنگی گرمەو قرمە؛ ۲) دەنگی بای بەقەوەت ف ۱) صدای بلند و مهیب؛ ۲) صدای تند وزیدن باد.

**کژك:** ۱) تەنـراوێکـە بەپـانـایی سێ ئەنگوستی پاڵ پێکەوەدراو ئاڵقەی تێدایەو تەنگـەی بارەبـەری پێ دەدەن، کەژو؛ ۲) تەواو سوتـاو؛ ۳) تەوژمی گران؛ ۴) برێتی لە دڵتـەنگو پەرێشان‌حاڵ ف ۱) نوار پهن تنگ بند ستور؛ ۲) کاملاً سوخته؛ ۳) فشار زیاد؛ ۴) کنایە از دلتنگ و پریشان‌حال.

**کژگ:** کژك ف نگا: کژك.

**کژنگ:** چنگنە ف حشرهٔ چسبیده بر پوست.

**کژورەك:** ۱) خێزەرە؛ ۲) تەختـەی ناسکی سەری دارەڕا کە بەپـانەوە دادەنرێ ف ۱) زنجیره بستن حشرات؛ ۲) تختەهای نازك و پهنی که روی الوار سقف گذارند.

**کژوٚلە:** چرپی‌و ئالاّش بوٚ بن‌قورەبان ف انبیره.

**کژەبا:** سەردەمی باهاتنی زوٚر ف موسم وزیدن باد.

**کژەباران:** سەردەمی باران‌بارینی زوٚر ف موسم بارانها.

**کژەبارانە:** کژەباران ف موسم بارانها

**کژیك:** قالاّو، قەلەڕەشە ف کلاغ.

**کژین:** پشمین ف عطسه‌کردن.

**کس:** ۱) وشەی دەنگ‌دانی مەڕ؛ ۲) وشەی دنەدانی سەگ؛ ۳) شەرمی مێوینە ف ۱) کلمەای برای راندن گوسفند؛ ۲) کلمەای برای تشجیع سگ؛ ۳) آلت تناسلی ماده.

**کسا:** چلوٚن، چوٚن؟ ف چطور؟.

**کسان:** کسا ف چەسان، چطور؟.

**کسب:** ۱) کاسبی؛ ۲) سنعات ف ۱) کسابت؛ ۲) صنعت.

**کسپ:** ۱) کاسبی: (ئەمساڵ **کسپو** کار باش نەبو)؛ ۲) سنعات ف ۱) کسابت؛ ۲) صنعت.

**کسپوکوٚ:** هەستی قێزو ڕك ف احساس خشم و نفرت.

**کسپـە:** ۱) راچـەنینی دڵ: (**کسپـە** لە دڵـمەوە هات)؛ ۲) دەنگی ئاو بەئاگردا کردن؛ ۳) ژانێ کەلە پڕ ئارام دەگرێ ف ۱) تکان ناگهانی قلب از خبـر ناگوار؛ ۲) صدای آب بر آتش پاشیدن؛ ۳) دردی که ناگهان آرام می‌شود.

**کسپەکسپ:** کسپەی زوٚر ف «کسپه»های پیاپی.

**کست:** تەنیشت، لا، ئالی ف نزد، پهلو.

**کستەنە:** کوشتن، گوژتن، مراندن ف کُشتن.

**کسسا:** شەرمی مێوینە، کس، کوز ف آلت تناسلی جنس ماده.

**کسك:** ۱) چزیلك؛ ۲) سەوزڕەنگ ف ۱) جزغالە؛ ۲) سبزرنگ.

**کس کس:** کسی زوٚر ف «کس» پیاپی.

**کسکوٚلە:** کزکوٚلە ف نگا: کزکوٚلە.

**کسکون:** تیر، بەرانبەری شلو تراو، کەسکون ف غلیظ.

**کسکـە:** ۱) ڕەنگی چاوی پشیلەو جانـەوەری کێوی لە تاریکی‌دا: (**کسکەی** چاوی دەهات)؛ ۲) کزوٚلە ف ۱) برق چشم جانوران در تاریکی؛ ۲) کزکرده.

**کسکـەکسـك:** بریقـەبریقی چاوی پشیلەو جانـەوەری کێوی لە تاریکی‌دا ف برق چشم جانوران در تاریکی.

**کسکیان:** سوُزیانەوەی پێست ف سوزش پوست.

**کسکیانەوە:** کسکیان ف سوزش پوست.

**کسـل:** ۱) قسـڵ، ئاهـەك؛ ۲) جانـەوەرێکـە قاپێلکێکی ڕەقی بوٚری خاڵ‌خاڵی هەیە زستـانـان لەبن خاکـا دەخەوێ‌و لە بەژو وشکانی‌دا دەژی، کیسەڵ، کیسوٚ ف ۱) آهك؛ ۲) لاك پشت.

**کسم:** ۱) پیشـە، سنعـات؛ ۲) کسـب؛ ۳) تەرح، دیدار؛ ۴) جوٚر ف ۱) صنعت؛ ۲) کسب؛ ۳) قیافه؛ ۴) نوع.

**کسوٚك:** ۱) سەگ؛ ۲) توتکەسەگ ف ۱) سگ؛ ۲) تولەسگ.

**کش:** ۱) وشەی دەرکردنی باڵدار؛ ۲) وشەیەکە لە شەترنجدا دەڵێن؛ ۳) وشەی بنەمای سەنگاندن؛ ۴) وشەی بنەمای ڕەکێش‌بوُن؛ ۵) وشەی بنـەمـای تیژ تێ‌پەڕین؛ ۶) بێ‌هەستو خوست: (دنیایەکی ماتو **کشە**/نە هەستە نە چرپەو خشە) «هەژار» ف ۱) کلمەای برای راندن پرنده؛ ۲) کیش شطرنج؛ ۳) وزن؛ ۴) کِش؛ ۵) گذشتن با سرعت؛ ۶) ساکت و بی‌صدا.

**کشا:** ۱) بەزەویدا ڕاکێشرا؛ ۲) بەپەلە خوشی: (ئەستێرەیەك **کشا**)؛ ۳) سەنگی زانـرا: (لە تەرازودا **کشا**) ف ۱) بر زمین کشیده شد؛ ۲) به سرعت گذشت؛ ۳) توزین شد.

**کشان:** ۱) بەرەوژوُر خشین؛ ۲) سەنگان؛ ۳) تیژ تێ‌پەڕین؛ ۴) مێ وەژێر نێرکـەوتـن بوٚ گـان. *تاییـەتـی بوٚ ماین‌و چێڵ دەیڵێن* ف ۱) روبەبالاخزیدن؛ ۲) توزین؛ ۳) گذر سریع؛ ۴) در زیر قرار گرفتن ماده هنگام جفتگیری.

**کشاندن:** ۱) ڕەکێش‌کردن بەزەویدا؛ ۲) راکێشانی گوریس‌و لاستیك؛

٣) سەنگـاندن بە تەرازی؛ ٤) مێ لەنێر چاکـردن [ف] ١) بر زمین کشـیدن؛ ٢) کش دادن؛ ٣) وزن کردن؛ ٤) اسـب یا کبـك ماده را دراختیار نر آن گذاشتن.

**کشاندنەوە:** ١) بەرەوپاش بردن؛ ٢) دوباره سەنگاندن [ف] ١) به عقب کشیدن؛ ٢) باز وزن کردن.

**کشـان کشـان:** ١) رەکێش ڕەکێش، بەزەویدا ڕاکێشان لەسەریەك؛ ٢) هێدیهێدی بەڕێدا هاتن [ف] ١) بر زمین کشیدن پیاپی؛ ٢) سلانه آمدن.

**کشانن:** کشاندن [ف] نگا: کشاندن.

**کشاننەوە:** کشاندنەوە [ف] نگا: کشاندنەوە.

**کشانەوە:** ١) بەرەودوا چوُن؛ ٢) درێژتر بوُن بە ڕاکێشان: (وەك لاستیك لەبـەریەك **دە کشێتـەوە**) [ف] ١) واپس رفتن؛ ٢) کش آمـدن، ازدیاد طول در اثر کشیدن.

**کشـاو:** ١) بەتـەرازو بەراوردکـراو؛ ٢) دەرهاتو لە کالان؛ ٣) ڕاکێشراو بەسـەر زەویدا؛ ٤) توتنی مژلێدراو [ف] ١) وزن شده؛ ٢) آختـه؛ ٣) بر زمین کشیده شده؛ ٤) سیگار پك زده شده.

**کشت:** چاندن، تۆم‌وەشاندن [ف] کشت.

**کشتا:** کوژاو، کوژراو، مرێندراو [ف] مقتول.

**کشتاڤیتس:** تخێل بوُگ، ڕاستڕاکشاو [ف] درازکشیده.

**کشتـاکـەوتش:** ١) سلارەوەبـوُگ؛ ٢) تخێل کەوتـو؛ ٣) دانیشتـوی بەپاڵەوپشت [ف] ١) از پای درآمده؛ ٢) درازکشیده؛ ٣) پشت به مُتّکیٰ نشسته.

**کشتش:** کوژران [ف] کشته‌شُدن.

**کشتکانی:** ١) دەم‌وزۆ؛ ٢) لابەلا؛ ٣) لارەولار [ف] ١) دمرو؛ ٢) یك‌وَری؛ ٣) تلوتلو رفتن.

**کشتۆخ:** مێرکوژ، کوژەر [ف] قاتل.

**کشتوکار:** چاندن‌و کێڵان [ف] کشت‌وکار.

**کشتوکاڵ:** کشتوکار [ف] کشت وکار.

**کشتوکنار:** دەوروبەر [ف] پیرامون.

**کشتـــە:** ١) کوژیاو؛ ٢) خالیگــە؛ ٣) گورچــك؛ ٤) لا، نالی [ف] ١) کُشته‌شده؛ ٢) تُهیگاه؛ ٣) گُرده؛ ٤) طرف.

**کشکشاندن:** ڕەکێش کردن بە زەمیندا [ف] بر زمین کشیدن.

**کشتەك:** چەند داوەدەزوی پێکەوەبادراو [ف] رشتهٔ نخ.

**کشتیار:** فەلا، جوُت‌بەندە [ف] کشاورز.

**کشتێل:** ئەسکوُ، ئەسکوێ [ف] ملاقه.

**کشك:** کژك، کەژو [ف] نگا: کژك.

**کش کش:** ١) وشەی دەرکردنی مریشك؛ ٢) جۆرێ داوەت‌و ڕەقس؛ ٣) وشـەی دنـەدانی تاژی بۆ ڕاو [ف] ١) کلمـه‌ای برای راندن مُرغ؛ ٢) نوعی رقص؛ ٣) کلمه‌ای برای برانگیختن سگ شکاری.

**کشکشان:** رەقسین لە داوەتی کشکش‌دا [ف] «کشکش» رقصیدن.

**کشکە:** ئادە، بژار [ف] ویجین.

**کشل:** کسل، قسڵ، ئاهەك [ف] آهك.

**کشمیش:** ئیشکەوەکراوی ترێی، بێ‌دەنك [ف] کشمش.

**کشمیشی:** ترێی وردی بێ‌دەندك [ف] انگور بی‌دانه، کشمشی.

**کشمیشی کاولیان:** دەموکانە [ف] نگا: دەموکانە.

**کشن:** گوشاد [ف] گشاد.

**کشنـە:** ١) کزِن؛ ٢) هەر دانـەوێڵەیەك کە بە ئاژەڵ دەدرێ [ف] ١) نگا: کزِن؛ ٢) آنچه از غلّات که به حیوان داده می‌شود.

**کشنیژ:** سەوزیەکی چاندنی‌یە [ف] گشنیز.

**کشنیژە:** جۆرێ موُرگی ئاڵتوُن‌و زێو بۆ زەنبەر [ف] نوعی مهرهٔ زینتی از طلا و نقره.

**کشۆڵ:** شۆقل [ف] نگا: شۆقل.

**کشـومـات:** ١) وشەیەکە لە شەترنجا دەگوترێ واتا: شا بێکار ما؛ ٢) بێ‌دەنگ، ئارام: (**کشوماتە** جیهان لەو ژوانی لەنوێ) «هەژار» [ف] ١) اصطلاحی در شطرنج، کیش و مات؛ ٢) آرام و دنج.

**کشە:** ١) وشەی دەرکردنی باڵدار: (**کشە کشە** پۆپەڕەشە، میوان شەوێك دوان خوەشـە) «مـەسـەل»؛ ٢) پێ‌دزە، بەرەودواچـوُنی لەسـەرخـۆ: (خـەریکی پاشـە**کشـە**یە) [ف] ١). اصطلاحی برای راندن پرنده؛ ٢) عقب‌نشینی یواشکی.

**کشی:** بە لەز ڕابرد [ف] باسرعت گذشت.

**کشیایا:** کوژراو [ف] مقتول.

**کشیایش:** کوشتن، مێرکوژی [ف] کُشتن.

**کشیایە:** کوژراو، کشیایا [ف] مقتول.

**کشین:** بە پەلە ڕابردن [ف] با سرعت گذشتن.

**کف:** ١) دەنگی هەڵچوُن‌و سەرڕێژکردنی جۆش‌هاوردە لە دیزەو بەرۆشدا؛ ٢) دەنگی تراوی لە ئاو تیرتـر کە بە تەوژم دەرپـەڕێ: (خـوێن لە جێ‌برینەکەی **کف** دەردەچو)؛ ٣) وەکری؛ ٤) باکردو [ف] ١) صدای بالاآمدن و جوشیدن مایع؛ ٢) صدای با فشار بیرون زدن مایع؛ ٣) باز؛ ٤) بادکرده.

**کفت:** ١) شەکـەت؛ ٢) بارەبەری بێ‌ناڵ: (ئێسترەشین **کفتە** دەبێ ناڵ کرێ)؛ ٣) تێ‌هەڵساوینی ڕەنگ: (زێڕکفت، زێوکفت)؛ ٤) نەخۆشی خۆرە؛ ٥) رەڵم، رەمـڵ؛ ٦) جۆش‌خواردنی بەتـەوژم: (**کفت و کوڵی** دانامرکێ)؛ ٧) شان‌وپیل [ف] ١) خسته؛ ٢) ستور بی‌نعل؛ ٣) اندودن؛ ٤) بیماری خوره؛ ٥) ماسه؛ ٦) بەشدّت جوش خوردن؛ ٧) سرشانه و کتِف.

**کفتـــك:** ١) تۆپـەڵ‌کراوی ساوەرو برنـج‌و گۆشت بۆ ناو چێشت؛ ٢) شەمچە [ف] ١) کوفتهٔ خوراکی؛ ٢) کبریت.

**کفتکاری:** رەنگ تێ‌هەڵساوین [ف] رنگ‌آمیزی.

**کفتوکۆ:** جۆش‌و تەوژمی گەرما: (**کفتوکۆی** دڵم دامرد) [ف] جوش و حرارت.

**کفتوکوڵ:** جۆشینی بەتەوژم [ف] جوشش شدید.

**کفتە:** ١) کفتك؛ ٢) بێ‌ناڵی بارەبەر [ف] ١) کوفتهٔ خوراکی؛ ٢) بی‌نعلی ستور.

**کفتەخۆر:** برێتی لە تەمەڵی کارنەکەرو نەوسن [ف] کنایه از تنبل پُرخور و

بیکاره.

**کفتی:** شه‌که‌تی [ف] خستگی.

**کفر:** ۱) دارێکی ده‌وه‌نه زۆرتر له ده‌م‌چه‌مان ده‌ڕوێ؛ ۲) ره‌نگی ڕه‌ش؛ ۳) قسـه‌ی بێ‌دینـانه؛ ۴) جگ، قاپ له بازیه‌کی جگێن‌دا؛ ۵) سخێف، جوێن، دژمێن، جنێو [ف] ۱) درختچه‌ایست؛ ۲) رنگ مشکی؛ ۳) گفتار ناروا، کُفر؛ ۴) شتالنگ در نوعی بازی؛ ۵) دشنام.

**کفرکردن:** قسه‌ی بێ‌دینانه گوتن [ف] سخن کفرآمیز گفتن.

**کفری:** شارێکه له کوردستان [ف] نام شهری در کردستان.

**کفریت:** شه‌مچه، گۆگرد، شخاته، شقارته [ف] کبریت.

**کفرێن:** جۆرێ بازی جگ [ف] نوعی قاپ‌بازی.

**کفش:** ئاشکرا، خۆیا [ف] آشکار.

**کففه:** کف [ف] نگا: کف.

**کفك:** برش، که‌ڕو، ژه‌نگی سه‌ر خوارده‌مه‌نی کۆن‌بوگ [ف] کَفَك.

**کف کردن:** باکردن، به‌باپه‌نه‌مان [ف] بادکردن.

**کفکێ:** تیروێ، دارێکی ده‌وه‌نه بنی باده‌ده‌ن ده‌رمانی بالوُکه‌یه [ف] درختچه‌ایست.

**کفگۆیان:** گوندێکه له کوردستان به‌عسی وێرانی کرد [ف] از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**کفگه:** چڵك‌و کرێژی له‌ش [ف] چرك و شورهٔ تن.

**کفن:** کراسی مردگ، خامێ که ده‌مردوُیه‌وه ده‌پێچن بۆ ناو قه‌بر [ف] کفن.

**کفن‌دزین:** برێتی له له نه‌خـۆشی زۆر گران رزگاربـوُن [ف] کنایهٔ از از بیماری خطرناك بهبود یافتن.

**کفن‌دز:** ۱) دزێ که قه‌بر بداته‌وه بۆ کفن‌دزین؛ ۲) سه‌رناوێکه بۆ که‌متار [ف] ۱) کفن‌دزد؛ ۲) لقب کفتار.

**کفه:** کف [ف] نگا: کف.

**کفه کف:** کفی زۆر [ف] «کف» پیاپی.

**کڤارگ:** قارچ، کارگ [ف] قارچ.

**کڤر:** پشیله‌گوربه [ف] گربهٔ نر.

**کڤش:** کفش، دیار، خویا [ف] پیدا، آشکار.

**کڤلۆشك:** قرمچی، هه‌ڵقرچاو، سیس‌بوُگ [ف] چروك شده.

**کڤلیشك:** بژانگ، مژۆڵ، برژانگ [ف] مُژه، مُژگان.

**کڤی:** کوُپه‌ڵه‌ی ده‌م‌ته‌نگ [ف] کوزهٔ دهانه‌تنگ.

**ککه:** قاقه، ققه، قه‌قه [ف] شیرینی در گویش کودکان، قاقا.

**ککه‌و:** دارێکی جه‌نگه‌ڵی زۆر سه‌خته، که‌قۆت، که‌وت [ف] درختی است جنگلی.

**کل:** ۱) سورمه؛ ۲) خوار، لار؛ ۳) لادان: (له ڕێگه **کل** بوه)؛ ۴) قوببه، گونبه‌ز؛ ۵) ره‌وانه: (بۆتۆم **کل** کرد)؛ ۶) دره‌وشانی هه‌ساره؛ ۷) هێما وه‌ده‌س بۆ خواحـــافیزی؛ ۸) زۆرچـــه‌رمـــگ؛ ۹) تینی ئاگر؛ ۱۰) کولـه‌کـولی گه‌رمـا [ف] ۱) سرمه؛ ۲) کج؛ ۳) انحراف؛ ۴) گنبد؛ ۵) روانـه، گسیل؛ ۶) چشمـك‌زدن ستـاره؛ ۷) دست تکـان دادن برای خداحافظی؛ ۸) بسیارسفید؛ ۹) حرارت آتش؛ ۱۰) شدّت گرما.

**کڵ:** ۱) سورمه، کل؛ ۲) جێگه‌ی سواڵه‌ت تێدا سوُرکردنه‌وه؛ ۳) پایه‌ی پرد؛ ۴) بڵێسه‌ی ئاگر [ف] ۱) سرمه؛ ۲) داش، کورهٔ سفال‌پزی؛ ۳) پایهٔ پل؛ ۴) شعلهٔ اتش.

**کلا:** ۱) له شوێن‌خۆ ده‌رچوُگ؛ ۲) بێ‌ته‌ره‌ف، دوُره‌په‌رێز [ف] ۱) منحرف؛ ۲) کناره‌گیر.

**کلابوُن:** ۱) له‌ڕێ لادان؛ ۲) دوُره‌په‌رێز وێستان [ف] ۱) انحراف از راه؛ ۲) کناره‌گیری.

**کلاچ:** بایی، به‌ده‌عیه، به‌فیز [ف] متکبّر.

**کلاژدم:** دوپشك [ف] عقرب.

**کلاس:** پۆلی فێرگه [ف] کلاس درس.

**کلاش:** ۱) خارشت، خورو؛ ۲) پێلاو له په‌ڕۆی به‌سه‌ریه‌کداته پێنراو [ف] ۱) خارش؛ ۲) نوعی گیوه.

**کلاشته:** خوراندن، به نینۆك کڕاندنی پێست [ف] خاراندن.

**کلاشچن:** ئه‌و که‌سه‌ی سه‌ری کلاش به به‌ن ده‌چنێ [ف] بافندهٔ رویهٔ «کلاش».

**کلاشدرو:** که‌سێ کلاش چێ ده‌کا [ف] «کلاش» ساز.

**کلاشدم:** دوپشك [ف] عقرب.

**کلاشکه‌ر:** کلاشدرو [ف] «کلاش»ساز.

**کلاشـه:** ۱) خورو، خارشت؛ ۲) له ئه‌نـدازه به‌ده‌ر [ف] ۱) خارش؛ ۲) خارج از اندازه.

**کلاشه کردن:** زۆری قوڕ له زه‌ویدا [ف] وفور گِل در زمین.

**کلاشین:** خوراندن، کلاشته [ف] خاراندن.

**کلاشینگه:** قه‌ڵماسك، قۆچه‌قانی، به‌ره‌قانی، که‌لاسینگ [ف] قلاسنگ.

**کلاف:** له یه‌کتر پێچانی ده‌زو به جۆرێکی درێژۆکه [ف] کلاف نخ.

**کلافه:** ۱) خه‌ڕه‌ك؛ ۲) سه‌رلێ‌شێواو، په‌شیواو؛ ۳) په‌تێکی به‌ئاڵقه‌یه له هه‌ردوك جومگـه‌ده‌ستی ئه‌سپی پێ ده‌بـه‌ستن بۆ ڕاهێنـانی ڕۆیشتنی خۆش؛ ۴) چوار چێوه‌ی باریك؛ ۵) کرێوه‌و باده‌وه [ف] ۱) دوك نخـریسی؛ ۲) سرگردان، آشفته، کلافه؛ ۳) ریسمانی که در تربیت اسب بکار می‌رود؛ ۴) چهارچوب نازك؛ ۵) کولاك.

**کلافـه‌هه‌ڵکه‌ر:** دارێکی به‌چه‌نگه ده‌سوُڕێ‌و ده‌زوی خه‌ڕه‌ك له خۆی ده‌هاڵێنێ [ف] کلاف پیچ.

**کلام:** قام، گۆرانی، چڕه [ف] ترانه.

**کلان:** ژاندنی مه‌شکه‌و ڕاتڵه‌کاندنی تراو [ف] تکان دادن مشك و مایعات.

**کلانه:** که‌للاره [ف] کاسهٔ تاپاله‌ای.

**کلانه:** موُروُ، موُرگ [ف] خرز، مهره.

**کلاو:** ئاره‌خچن، پۆشاکی سه‌ر [ف] کُلاه.

**کلاوئـاڵتـوُن:** کلاوێ که له سکـه‌زێڕی پێکـه‌وه‌لکـاو دروس ده‌کرێ، خشڵێکی ژنانه [ف] کلاه ساخته‌شده از سکه‌های طلا که زیوری است زنانه.

**کلاوبن:** جۆرێ ڕێواس [ف] نوعی ریواس.

**کلاوبۆرکه:** کلاوی له به‌رگن [ف] کلاهِ نمدی.

**کلاوبۆره:** کلاوبۆرکه [ف] کلاه نمدی.

**کلاوچن:** ئه‌و که‌سه‌ی کلاو به ده‌زوُ ده‌ته‌نێ [ف] بافندهٔ کلاه.

**کڵاوخوُد:** کڵاوی ئاسنینی شەڕکەر [ف] کُلاه‌خود.
**کڵاودار:** باڵداری سەربەپۆپەی لە پەڕ [ف] پرندهٔ شانه‌بەسر.
**کڵاودرو:** کەسێ کە کڵاو بۆ فرۆشتن دەدروێ [ف] کُلاهدوز.
**کڵاوڕۆژنە:** ڕۆچنەی سەربان [ف] روزنهٔ بام.
**کڵاوڕەش:** ۱) نەخۆشیەکی تایبەتی بزنە؛ ۲) برێتی لە ئێرانی: (لە مابەینی کڵاوسوُرو **کڵاوڕەش**) «حاجی قادر» [ف] ۱) بیماری ویژهٔ بز؛ ۲) کنایه از ایرانی.
**کڵاوزرێ:** کڵاوخوُد [ف] کُلاه‌خود.
**کڵاوزەڕ:** ۱) کڵاوئاڵتون؛ ۲) ناوە بۆ ژنان [ف] ۱) کلاه‌زرین؛ ۲) نام زنانه.
**کڵاوزێڕ:** کڵاوزەڕ [ف] نگا: کڵاوزەڕ.
**کڵاوڕەشە:** جێگەی سەری چەلاك لە ڕەشماڵدا [ف] جای سر ستون درسیاه‌چادر.
**کڵاوســـوُر:** ۱) گیایەکە بنكسوُر بۆ ئاش دەبێ؛ ۲) برێتی لە ترکی عوسمانی [ف] ۱) گیاهی است آشی؛ ۲) کنایه از تُرك عثمانی.
**کڵاوفەڕەنگی:** ۱ قوتکەیەکە بەسەر بۆریەسۆبەدا دەکرێ تا با دوکەڵ نەگەڕێنێتەوە؛ ۲) نەخشێکە لە فەڕشدا [ف] ۱) کلاهك بالای لوله بخاری؛ ۲) نقشی در قالی.
**کڵاوقازی:** هەزارلایەی ناو ورگ [ف] هزارلای شکمبه.
**کڵاوقـۆری:** کڵاوی لە پوُشی لێودار بۆ دروێنەوانان [ف] کلاه حصری لبه‌دار دروگران.
**کڵاوقژ:** پۆڕی بەدەڵ، قژی ئامانەتی [ف] کُلاه‌گیس.
**کڵاوکڵاوێن:** بازیەکی شەونشینیە [ف] نوعی بازی در شب‌نشینی.
**کڵاوکوُڕ:** ناوی چیایەکە [ف] نام کوهی در کردستان.
**کڵاوکوڕە:** چوڕەپۆپنەکی [ف] پرنده‌ایست شانه‌بەسر.
**کڵاوگەڕە:** کڵاوی لێواردار لە بەرگنی پەستواو [ف] کلاه‌لبه‌دار نمدی.
**کڵاونە:** چوڕەپۆپنەکی [ف] پرنده‌ای است.
**کڵاوە:** ۱) پۆپەی باڵدار لە پەڕ؛ ۲) ترۆپکی چیا؛ ۳) لاسکەگەنمەشامی کە دانی نەگرتبێ؛ ۴) قوڕێ لە دەوری دەمی دولاش بڵنـدکـراو؛ ۵) ئاڵقەی دارینی ملی گاجوت؛ ۶) هەرشتێ قۆچ لە سەرەوە؛ ۷) سەلکی گیا؛ ۸) دەنکی درشتی بەفـر [ف] ۱) شانهٔ سر پرنده؛ ۲) قلّهٔ کوه؛ ۳) بلال دانه‌نگرفته؛ ۴) دیوارك پیرامون دهانهٔ ناوآسیاب؛ ۵) چنبر گردن گاو؛ ۶) کلاهك؛ ۷) پیازه؛ ۸) دانهٔ درشت برف.
**کڵاوەسوُرە:** گیایەکی بنكسوُرە، کڵاوسوُر [ف] گیاهی است با پیازهٔ قرمز.
**کڵاوە کردن:** بارینی بەفری دەنكدرشت [ف] بارش برفِ درشت.
**کڵاوێن:** بازی کڵاوکڵاوێن [ف] نوعی بازی شبانه.
**کلب:** ۱) ددانی پێشـــەوەی سەگو دڕنـدە؛ ۲) گوڵمێخ، سنگی درێژو ئەستور [ف] ۱) ناب، دندان پیشین درنده؛ ۲) میخ تویله.
**کلبازك:** ۱) گوڵەنەورۆزە؛ ۲) گیای لەدەفرا شین کراو بۆ نەورۆز [ف] ۱) از گُلهای بهاری است؛ ۲) سبزهٔ شب عید.
**کلبـوُن:** ۱) کلابـوُن؛ ۲) بەرێ‌کران؛ ۳) درەوشینەوەی ئەستێرە [ف] ۱) منحرف شدن؛ ۲) فرستاده شدن؛ ۳) چشمك زدن ستاره.
**کلپاتە:** فزە، کەمترین دەنگ [ف] کمترین صدا.
**کڵپوهوڕ:** دەنگی بڵێسەی بەتەوژم [ف] صدای اشتعال زیاد.
**کڵپـە:** ۱) دەنگی بڵێســەی ئاگر؛ ۲) بڵێسەی ئاگر [ف] ۱) صدای آتش مشتعل؛ ۲) شعلهٔ آتش.
**کڵپەکڵپ:** دەنگی لەشوێن‌یەکی بڵێسە [ف] صدای پیاپی اشتعال.
**کلپێچك:** بابۆڵەی زاڕۆتێ‌پێچان، قۆنداخ، قومات [ف] قنداق نوزاد.
**کلتوُر:** سورمەدان [ف] سرمه‌دان.
**کلتە.** کلتوُر [ف] سرمه‌دان.
**کلتـەپـە:** گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد [ف] از روستاهای ویران شدهٔ کُردستان توسط بعثیان.
**کلج:** ئەو چێوەڵە لوُس‌و باریکەی کلی پێ دەچاو دەکێشن [ف] میل سرمه‌کشی.
**کڵجە:** سوخمەی قۆڵداری ژنانە [ف] یلك آستین‌دار.
**کلچان:** فانۆز، فانوُس، چرادەستی، لەنتەری [ف] فانوس.
**کلچك:** کلچۆك، کلج [ف] میل سُرمه‌کشی.
**کلچۆ:** کلج [ف] میل سرمه‌کشی.
**کلچۆڤ:** کلج [ف] میل سرمه‌کشی.
**کلچۆك:** کلج [ف] میل سرمه‌کشی.
**کلچیو:** کلج [ف] میل سرمه‌کشی.
**کلچێو:** کلج [ف] میل سرمه‌کشی.
**کلچێوك:** کلج [ف] میل سرمه‌کشی.
**کلچێوکەگورکانە:** گیایەکەنێرتکێ سوری ئاماڵڕەش دەکا [ف] گیاهی است.
**کلدان:** کلتوُر [ف] سرمه‌دان.
**کڵدان:** کلتوُر [ف] سرمه‌دان.
**کلدومان:** هەڵم‌وبۆغ [ف] بُخار مُتراکم.
**کلر:** کونی درگا، جێ کلیل لە درگادا [ف] جاکلیدی در.
**کلس:** ۱) قسـڵ، ئاهەك؛ ۲) ناوچەیەکە لە کوردستان [ف] ۱) آهك؛ ۲) ناحیه‌ای در کردستان.
**کلسم:** گیایەکی دەشتەکیە [ف] گیاهی است.
**کلسین:** گوُش، گیای کەنەف کە تەلیسی لێ دەتەنن [ف] گیاه کَنَف.
**کڵف:** کڵافەدەزو [ف] کلاف.
**کڵفت:** ۱) ئەستوُر؛ ۲) زۆر، زیاد: (پوُڵێ **کڵفتی** ها بەلاوە) [ف] ۱) ستبر، کلفت؛ ۲) مبلغ زیاد.
**کڵفەت:** ۱) ئەستوُری؛ ۲) خێزانی ماڵ؛ ۳) قەرەواش [ف] ۱) ستبری؛ ۲) عائله؛ ۳) کُلفت‌خانه.
**کڵفەتبار:** خێزاندار [ف] عیالوار.
**کڵفەت‌دار:** ۱) کڵفەتبار؛ ۲) ماڵێ قەرەواشیان هەبێ [ف] ۱) عیالوار؛ ۲) خانه‌ای که کُلفت دارد.
**کلك:** ۱) قامـك، تبـل، تل، ئەنگوست؛ ۲) دو، جوچکە؛ ۳) قەڵەم؛ ۴) دەسك [ف] ۱) انگشت؛ ۲) دُم؛ ۳) قلم؛ ۴) دسته.

**کلکاف:** بەرێکی دارمازوە ف نوعی ثمر مازوج.

**کلك‌بادان:** ۱) زمان‌لوسی‌و مەرایی؛ ۲) برێتی لە ناچارکردن بە کارێك ف ۱) چاپلوسی و تملّق؛ ۲) کنایە از ناچار کردن.

**کلکان:** برێتی لە پیای حۆل‌و کەم‌هۆش ف کنایە از آدم خل و منگ.

**کلکانی:** بێهۆشی، حۆلی ف کم هوشی.

**کلك‌بەس:** قامك بەند ف انگشت‌بند.

**کلك‌بەسە:** بە قامك‌بەستراوی ف انگشت بستە.

**کلك‌پێوەکردن:** ۱) جوزپێوەکردن؛ ۲) برێتی لە خەڵەتاندن ف ۱) انگلك‌زدن؛ ۲) کنایە از فریب دادن.

**کلك‌پێ‌هەڵپەساردن:** برێتی لە گوێ‌نەدان بە کار، خۆگێل‌کردن لە ئەنجام‌دان، خاوەخاو ف کنایە از اهمال.

**کلك‌تەقنە:** بەرگایلکە ف دم جنبانك.

**کلك‌تەقێنە:** بەرگایلکە ف دم جنبانك.

**کلکدار:** ۱) جانەوەری بە‌کلك؛ ۲) شتێ دەسکی هەبێ؛ ۳) دوایی‌دار ف ۱) دارای دم؛ ۲) دستەدار؛ ۳) دنبالەدار.

**کلکردن:** ۱) خوارکردنەوە؛ ۲) ناردن ف ۱) کج کردن؛ ۲) فرستادن.

**کلکرن:** چاوڕشتن بە سورمە ف سُرمەکشیدن چشم.

**کلك‌گر:** ئەسپێ کە کلکی لە غاردا ڕاست بڵنـد دەکا ف اسبی کە در دویدن دم را بلند نگە می‌دارد.

**کلك‌گرتن:** ۱) کلك‌بڵندکردنی ئەسپ لە غاردا؛ ۲) برێتی لە خستنە‌ناچاریەوە ف ۱) دم بلند نگەداشتن اسب؛ ۲) کنایە از در تنگنا گذاشتن.

**کلك‌گیر:** قوشقونە ف پاردم زین اسب.

**کلکلك:** شمشێرەی درگا ف کلید کلون چوبی در.

**کلکلە:** فەزیعەت ف مایۀ رسوایی.

**کلکن:** ۱) کلکدار؛ ۲) پەزی زۆر بەخوری؛ ۳) هەڵتۆقیولە پێست ف ۱) نگا: کلکدار؛ ۲) گوسفند بسیار پشمالو؛ ۳) برآمدە بر پوست.

**کلك‌نیشان:** شتی زۆر سەیر یان زۆر باش ف انگشت‌شمار، کمیاب.

**کلکە:** ۱) دەنکێکە لە ناو گەنمدا؛ ۲) زارۆی سەربار؛ ۳) بڕانەوەی کێو؛ ۴) دوایی قسەو کار ف ۱) دانەای در میان گندم؛ ۲) بچۀ انگل و سربار؛ ۳) دنبالۀ کوە؛ ۴) دنبالۀ سخن و کار.

**کڵکە:** پرد، پر ف پُل.

**کلکەتوتە:** توتە ف انگشت کوچکە.

**کلکەدۆمانە:** باریکەیەك گەنم لە خەرماندا کە هێشتا نەبۆتە مالۆسکە ف دنبالۀ خرمن.

**کلکەڕەقە:** نەخشێکی قاڵی ف نقشی در قالی.

**کلکەڕێوی:** ۱) بەری گیایەکە؛ ۲) جۆرێ ترێ ف ۱) ثمر گیاهی است؛ ۲) نوعی انگور.

**کلکەسوتە:** ۱) کلك‌ڕاتەکاندنی سەگ بۆ کەسێ کە خۆشی دەوێ؛ ۲) برێتی لە ڕیایی‌و زمان‌لوسی ف ۱) دم جنبانـدن سگ برای اظهار وفاداری؛ ۲) کنایە از تملّق.

**کلکەسوتەکێ:** کلکەسوتە ف نگا: کلکەسوتە.

**کلکەقنگێ:** ۱) قامك‌بۆبردن؛ ۲) برێتی لە دنەدان بۆ تووڕەکردن ف ۱) انگلك کردن؛ ۲) کنایە از تحریك برای خشمگین کردن.

**کلکەکنگێ:** کلکەقنگێ ف نگا: کلکەقنگێ.

**کلکەکەڵە:** قامکی زل، قامکەگەورە ف انگشت شست.

**کلکەگەورە:** کلکەکەڵە ف انگشت شست.

**کلکەلەقە:** دژواری زۆر لە پێك‌هێنانی کارا ف سختیِ بسیار در انجام کار.

**کلکەلەقێ:** ۱) دژواری زۆر لە پێك‌هێنـانی کارا: (بـە **کلکەلەقێ** خەلاسم کرد)؛ ۲) کلکەسوتە ف ۱) دشواری بسیار در انجام دادن؛ ۲) نگا: کلکەسوتە.

**کلکەمار:** زۆر تاڵ لە چێژەدا ف بسیار تلخ.

**کلکەمارکردن:** خواردنی بەناڕەحەتیەوە، زەقنەمۆت‌کردن ف خوردن با دل پریشان.

**کلکەنما:** شتێ کە بۆ باشی‌و خراپی ئاشیرەتی بۆ بکرێ ف انگشت‌نما.

**کلکەنەفتینە:** کتکەنەفتینە ف فتنەانگیز.

**کلکەوانە:** ۱) ئەنگوستیلە؛ ۲) قوچەکەی دورمانان ف ۱) انگشتری؛ ۲) انگشتانە.

**کلك‌هەڵتەکێنە:** کلك‌تەقێنە، بەرگایلکە ف دم جنبانك.

**کلك‌هەڵسوڕاندن:** برێتی لە بەرەنگاری‌کردن‌و بەقسەنەکردن ف کنایە از مخالفت کردن.

**کلل:** ۱) ماین‌و ئەسپی سپی خاڵدار؛ ۲) ئەسپی سپیلك؛ ۳) ڕەنگ‌سپات ف ۱) اسب سفیدِ خالدار؛ ۲) اسب ابلق؛ ۳) رنگ کِرم.

**کللۆ:** ۱) گای سپی‌و ڕەش؛ ۲) کولەی زرعات‌خۆر؛ ۳) جانەوەری سپی بەخـاڵی ڕەشـەوە ف ۱) گاوسفیدوسیاە؛ ۲) ملخ؛ ۳) جانـور سفید دارای خالهای سیاە.

**کللی:** ۱) سپات؛ ۲) سپی خاڵدار؛ ۳) گڕی ئاگر ف ۱) رنگ کِرم؛ ۲) سفید خالدار؛ ۳) زبانۀ آتش.

**کلم:** کورت، قوت، کن، کۆتا ف کوتاە.

**کڵم:** چڵم ف خلم، آب بینی.

**کلمش:** ۱) ڕیپۆقی چاو؛ ۲) چڵکی ناوگوێ ف ۱) ژفك چشم؛ ۲) چرك گوش.

**کڵمن:** چڵمن ف خلمو، آب دماغ آویزان.

**کلمۆ:** کورتەباڵا، بەژن‌کنك ف کوتاەقدّ.

**کلموچ:** چڵم ف خلم، آب بینی.

**کلمەی:** کورت‌کردن، قوت کردن ف کوتاە‌کردن.

**کڵمیش:** ۱) چڵم؛ ۲) ڕیپۆقی‌چاو ف ۱) خلم، آب بینی؛ ۲) ژَفك.

**کڵناشك:** قانگەلاشك ف گیاە خشك بادبردە.

**کلو:** ۱) دەنکی بەفر؛ ۲) پێچراوی خوری‌و لۆکەی خاو؛ ۳) بەرگی ڕێزێ دەنـك لە بەری گیادا ف ۱) دانـۀ برف؛ ۲) آغنـد، تودۀ پشم و پنبـۀ نارشتە؛ ۳) نیامك هستۀ گیاە.

**کلۆ:** جانەوەرێکی پچوکی بەچنگ‌و باڵە دوژمنی شیناوەردە ف مَلَخ.

**کڵۆ:** هەر وردێکی یەکترگرتو: (**کڵۆگڵ، کڵۆقەند**) ف ریز بهم چسبیدە،

کلوخ.

**کلوا:** پەنگریٚ‌سوٚر، پۆلو ی‌بەگەشە، سکلٚ ف أخگر.

**کلۆت:** ۱) ئێسکی سەر سمتی یەکسم؛ ۲) سمتی یەکسم ف ۱) استخوان بالایی ران ستور؛ ۲) کَفَل.

**کلۆج:** تەرز: (بە هیچ **کلۆجێ** چارەی نایە) ف رویه، طریقه.

**کلۆچ:** ۱) کولیچە؛ ۲) قوٚچ، شاخی جانەوەر ف ۱) کلوچه؛ ۲) شاخ جانور.

**کلۆخ:** ۱) قەحفی سەر؛ ۲) وشەی ئاژەڵ بژاردن، سەر ف ۱) کلّهٔ سر؛ ۲) واحد شمارش دام، رأس.

**کلۆر:** ۱) ناوبەتاڵ؛ ۲) خڕەوەبوگ: (خوٚی **کلۆر** کرد) ف ۱) میان‌تهی؛ ۲) خود را جمع کردن.

**کلۆر:** بەدبەخت ف بدبخت.

**کلوز:** گولەگەنمی هەڵبرژاو ف خوشه‌گندم نیم‌سوخته.

**کلۆز:** رستەتا، وشەیەکی ریزمانە ف شبه‌جمله.

**کلۆز:** ۱) کەسێ کە ددانی پێشوی کەوتوە؛ ۲) کڵاوبوٚرە ف ۱) کسی که دندان پیشین ندارد؛ ۲) کلاه نمدی.

**کلوس:** دەفری سواڵەتی هەراو، کوپە ف خُم.

**کلۆس:** کلۆز ف نگا: کلۆز.

**کلوسك:** دەفری سەرئاواڵەی چکوٚڵە، بستوگە ف خمچه، خُم کوچك.

**کلۆش:** قرش، لاسکەدەغڵ ف ساقه‌های غلّه.

**کلۆشك:** نیشان لەرێگەدا، کێلەکارێکێ ف نشان‌های راهنما در مسیر راه.

**کلۆشەبون:** گەیشتنی دەخڵ بوٚ درەو ف رسیدن خرمن برای درو.

**کلوٚف:** بەچنگ گوشین ف مچاله.

**کلۆفت:** کلفت، زوٚر ئەستوٚر ف کلفت، ستبر.

**کلۆك:** ۱) دانەویٚڵەیێ کە زوٚ لە ئاوی جوٚشدا پێ‌دەگا؛ ۲) کلۆت ف ۱) دانهٔ زودپز؛ ۲) کفل چهارپا.

**کلۆك:** شکوٚفەی دار ف شکوفهٔ درخت.

**کلۆکێ:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**کلۆڵ:** چارەڕەش، کلۆر ف سیه‌روز.

**کلۆلاش:** گیایەکە دەکرێتە ددان‌ئاژن ف گیاه خلال دندان.

**کلۆم:** قفڵی دارینی درگا ف قفل چوبی در.

**کلۆمت:** کلۆت، سمتی حەیوان ف کفل حیوان.

**کلۆنجه:** سوخمەی بەقوٚڵی ژنانە ف نوعی بالاپوش زنانه.

**کله:** ۱) تین و هاڵاو؛ ۲) گڕی ئاگر؛ ۳) سوتمەنی ف ۱) آلاو؛ ۲) لهیب آتش؛ ۳) سوخت.

**کڵه:** ۱) کل، سورمە؛ ۲) کڵی پرد ف ۱) سرمه؛ ۲) پایهٔ پل.

**کلهایش:** کوٚکین، توٚزین، کوٚخین ف سرفه‌کردن.

**کلەپیچ:** کارپوچ، خشتی کاڵ ف خشت خام.

**کڵەدان:** کلدان ف سُرمه‌دان.

**کلەر:** ۱) کولێن، جیٚگەی ئازوٚقە؛ ۲) مو بەق، مدبەق ف ۱) جای آذوقه؛ ۲) نگا: مو بەق.

**کلەسوبحانی:** چاکترین‌جوٚری کل ف بهترین نوع سُرمه.

**کلەشێر:** دیکل، دیقل ف خروس.

**کلەشێره:** خروٚزەك، قفەرەشە ف بیماری سعال دیکی، خروسك.

**کلەو:** شەپوٚلێ کە وەسەر پرد دەکەوێ ف موجی که روی پل سرریز کند.

**کلێ:** کایە، جارێك بازی کردن ف یك دور بازی، گیم.

**کلێپ:** ئامادەکردن‌و دابێژتنی خاك ف آماده کردن خاك برای تهیهٔ گِل.

**کلیت:** ۱) کلیل، هاچەر؛ ۲) قفڵ، گوٚڵە؛ ۳) ئاڵقەرێزی درگا کە قفڵی پێدا دەکرێ ف ۱) کلید؛ ۲) قُفل؛ ۳) حلقهٔ در که قفل را در آن کنند.

**کلیته:** قەڵاندوٚش، نێوان شان‌و پیل ف کوله، شانه‌ودوش، قلمدوش.

**کلێته:** سەرکڵاوەی بەن ف کلوته، نوعی کلاه پشمی.

**کلێجه:** قلێچکە ف دنبالچه.

**کلیچ:** کولیچە ف کلوچه.

**کلیچك:** قامکەتوٚتە، تلیاگچکە، ئەنگوسە توٚتەلە ف انگشت خنصر.

**کلیچه:** کولیچە ف کلوچه.

**کلێچه:** کولیچە ف کلوچه.

**کلید:** کلیل، کلیت ف کلید.

**کلیده:** لە هەمولاوە دەورەدراو ف محصور.

**کلیر:** کلر، کونی جێ‌کلیل لە دەرگادا ف جاکلیدی در.

**کلیزی:** لیکاوی دەم ف لعاب دهن.

**کلیژ:** کلێنچکە ف دنبالچه.

**کلێس:** تارومار، لەبەین‌چوٚگ ف نابود، تارومار.

**کلیسا:** پەرستگای خاچ‌پەرستان ف کلیسا.

**کلێس بوٚن:** بەتەواوی فەوتان ف ریشه‌کن شدن، نابودشدن.

**کلێسمان:** کلەسوبحانی ف بهترین نوع سُرمه.

**کلێسه:** کلیسا ف کلیسا.

**کلێشه:** ۱) بەدەنی بێ‌گیان: (شەیتان چوٚتە **کلێشەیەوە**)؛ ۲) بوٚدرنی لەش لە تارەفەو چڵك ف ۱) تن بیجان؛ ۲) بوی بدِ تن.

**کلیل:** ۱) ئاچەر، شتێ کە قفڵ بکاتەوە؛ ۲) موی سەری لێك‌هاڵاو؛ ۳) قفڵ ف ۱) کلید؛ ۲) موی فرفری؛ ۳) قفل.

**کلێل:** کلیل ف کلید.

**کلیل‌بەدەست:** برێتی لە خاوەن‌دەسەڵات ف کنایه از همه‌کاره.

**کلیل‌دان:** قفڵ‌دان، داخستن‌بەقفڵ‌وکلیل ف قُفل کردن.

**کلیلك:** کلیلی دارینی کلیلەو گوٚڵە ف کلید چوبین.

**کلیلکامل:** چوٚڵمەمە ف جناغ سینه.

**کلیل‌وکوٚم:** قفڵی دارینی درگا ف قفل چوبین در.

**کلێل‌وکوٚم:** کلیل و کوٚم ف قفل چوبین در.

**کلیل‌وگوٚڵ:** کلیل وکوٚم ف قفل چوبین در.

**کلیل‌وگوٚڵه:** کلیل وکوٚم ف قفل چوبین در.

**کلیله:** رنو، رنی ف بهمن.

**کلێڵه:** ۱) کلیلە؛ ۲) رەق‌بوٚنی دەم: (دەمی **کلێڵە** بو قسەی بوٚ نەکرا) ف ۱) بهمن؛ ۲) قفل شدن دندانها.

**کلیم:** بەڕە، سیپاڵ، رایەخی تەنك‌و کەم‌بایی ف گلیم.
**کلێنجە:** قلیچە، کلیچە ف دنبالچە.
**کلێنچك:** قلیچە، کلیچە ف دنبالچە.
**کلێنچکە:** قلیچە ف دنبالچە.
**کم:** ۱) بەرانبەری زیاد، پیچ، قیچ؛ ۲) بکەم ف ۱) اندك؛ ۲) بکنم.
**کماخ:** کلۆت ف کَفَل.
**کمان:** یەرژین، چیل ف پرچین.
**کم‌بەر:** گولێکی بەهاریە ف ازگلهای بهاری است.
**کمت:** ترۆپك، دوند، بەرزترین‌شوین ف قُلّه، اوج.
**کمکمە:** پیچ‌پیچ ف اندك اندك، بەتدریج.
**کمێ:** دونبەلان، چمە ف دنبلان.
**کن:** ۱) قنـــگ؛ ۲) بەرانبـــەری درێژ؛ ۳) لەلا، لەپـــەنـــا؛ ۴) وشـەی بانگ‌کردنی ژن بۆ خۆشەویستی ف ۱) مقعد؛ ۲) کوتاه؛ ۳) نزد؛ ۴) حرف خواندن مهر بانانهٔ زن.
**کنا:** ۱) دۆت، قز، قیز، کچ؛ ۲) قول، دیواودەر ف ۱) دختر، دوشیزه؛ ۲) سوراخ.
**کناچە:** ۱) کچ؛ ۲) دەنگی پۆڕ ف ۱) دختر؛ ۲) صدای درّاج.
**کناچەیی:** کچێنی ف نگا: کچێنی.
**کناچێ:** کچ ف دوشیزه.
**کنار:** داری نەبگ ف درختی است.
**کناراو:** ئاودەست، مەبال ف مستراح.
**کناری:** دڕکەزی ف خاربنی است.
**کنـارێن:** ۱) سەرلێواری دەریا؛ ۲) دورەپـەرێز لە خەڵك ف ۱) ساحل دریا؛ ۲) کنارەگیر از اجتماع.
**کنتـەنـە:** ۱) لەش‌خوران؛ ۲) لەش‌خورانـدن ف ۱) خارش بدن؛ ۲) خاراندن بدن.
**کنج:** ۱) جلك‌و کەل‌وپەل؛ ۲) پارچەجلکی لە پشتێن بەرەژوور، کەوا؛ ۳) کرچ، کاڵ؛ ۴) لای نێوان شت ف ۱) ملابس، رخت و لبـــاس؛ ۲) نیم‌تنه؛ ۳) کال؛ ۴) لایه.
**کنجڕ:** پەڕۆکۆن. بزگوڕ ف کهنه‌پاره.
**کند:** کن، بەرانبەری درێژ، قوڵە ف کوتاه.
**کنـدر:** ۱) دەزوی قڕقـڕە؛ ۲) پەتی لە پرزەی گیا؛ ۳) قنگر ف ۱) نخ قرقره؛ ۲) ریسمان الیافی؛ ۳) کنگر.
**کندڕ:** شوێنێ کە ئاو دای دڕیوە ف جای آب رُفته.
**کندردڕك:** دڕکێکە ف خاربنی است.
**کندرە:** کندر ف نگا: کندر.
**کندێلە:** کندر ف نگا: کندر.
**کنر:** کندر ف نگا: کندر.
**کنسا:** خۆ بەدیوار خوراندن ف خود را با دیوار خاراندن.
**کنشت:** ۱) کاوێژ، قاویش؛ ۲) پەرسگـای جوولەکە ف ۱) نشخوار؛ ۲) معبد یهودیان، کُنشت.
**کنف:** ۱) مێشەی پڕی دەس نێژ؛ ۲) لوس‌و لێك‌و لەبار ف ۱) بیشهٔ انبوه؛ ۲) شیك.
**کنْك:** کن، قولْ، قولْە ف کوتاه.
**کنگ:** قنگ، کن، قن ف مقعد.
**کنگ‌دانەوە:** رونیشتنی بە ئامانەتی ف موقّت نشستن.
**کنگ‌دەر:** قوُن‌دەر ف کونی.
**کنگر:** قنگر ف کنگر.
**کنگـەجنـۆکە:** برێتی لە جێگای زۆر تەنگ‌و تەسك ف کنایه از جای بسیار تنگ و کوچك.
**کنگەخشکێ:** قوُنەخشکە ف باسن بر زمین کشیدن.
**کنگەخەو:** نوستن بە دانیشتنەوە ف نشسته خوابیدن.
**کنگەگاز:** برین لە پاشڵی ئەسپ‌و بارەبەر ف زخم باسن اسب و دیگر چهارپایان.
**کنگەوتلور:** لەسەردەم راکنسان ف هنگام دراز کشیدن.
**کنۆڕك:** ۱) تێلەکەدڕك؛ ۲) داری دولق بۆ دڕك گوێزتنەوە ف ۱) پشتهٔ خار؛ ۲) چوب دوشاخه ویژهٔ جابجایی خار.
**کنۆڕە:** داری دوفلیقانەی دڕك‌خڕکردنەوە ف چوب دوشاخهٔ خار جمع‌کنی.
**کنۆژ:** رژد، چکوُس، چکوُد، دەس‌قوچاو ف خسیس.
**کنۆس:** رژد، کنۆژ ف خسیس.
**کنوُشك:** ڕەنگی پەمەیی، سوُری کاڵ، چێرەیی ف صورتی.
**کنۆشە:** گزگ، گەسك، گێزگ ف جارو.
**کنە:** ۱) کاری زۆرو بەدەوام؛ ۲) وشەی دواندنی کچ؛ ۳) دانەوەی‌زەوی؛ ۴) تۆژینـەوە ف ۱) کار زیاد و پیوستـه؛ ۲) کلمـهٔ نوازش خطاب به دختر؛ ۳) زمین را کندن؛ ۴) کندوکاو.
**کنەك:** خێشکی کلۆش کێشان ف ابزار ساقه‌کشیدن سر خرمن.
**کنە کردن:** کۆڵینەوە، تۆژینەوە ف کاوش، جستجو.
**کنەوە:** ۱) پروشەکردن لە خواردن؛ ۲) کۆڵینەوە؛ ۳) زۆر کۆششت کردن لە کاردا ف ۱) بی‌اشتها و آهسـته خوردن؛ ۲) کاوش؛ ۳) سعی بسیار در کار.
**کنێر:** ۱) ناوی دو جۆر دارە. یەکی بەدڕك یەکی بێ‌دڕك؛ ۲) گیایەکـە گوڵی جوانی هەیە؛ ۳) قوُنێر، کوانێکە لەجێگەی خراب دێت ف ۱) نام دو درخت خاردار و بی‌خار؛ ۲) گیاهی است با گلهـای زیبـا؛ ۳) دُملی که در ناحیهٔ مقعد باشد.
**کنێروٚك:** گیای کنێر ف گیاه «کنێر».
**کنـێرە:** ۱) داری کنـێری بێ‌دڕك؛ ۲) گیای کنێر ف ۱) درخت «کنێر» بی‌خار؛ ۲) گیاه «کنێر».
**کنیواڵ:** گیایەکی چیایە ئەخورێ، کوڕادە ف گیاهی است کوهی تره‌مانند.
**کۆ:** ۱) زۆرشت پێکەوە؛ ۲) پیرو، پیرۆ؛ ۳) نەخۆشیەکی چاوی‌ئاژەڵ؛ ۴) تۆپـەڵی خرمـانی سوُر؛ ۵) چیا؛ ۶) سڵی، رەوەکی: (ئـەم ئەسپە کۆ دەکـا)؛ ۷) رەنگی عابی ئاچـخ؛ ۸) ناوی شارێکە لە کوردستان؛ ۹) پاشگری پچوُك‌شاندان: (حەسەنکۆ، لاوکۆ)؛ ۱۰) کام جێ: (بۆ کۆ

بچم؟)؛ ۱۱) خەفەت. بە شوێن کوڵ‌دادێت : (کولْ و کوٚم زوٚرن)؛ ۱۲) کول، نەبڕ، دژی تیژ؛ ۱۳) جفات، لێك‌کوٚ بوٗنەوە؛ ۱۴) بەڵکە، شایەتا ف ۱) جمع؛ ۲) ستارهٔ ثریّا؛ ۳) نوعی بیماری چشم بز و گوسفند؛ ۴) تودهٔ خرمن پاك کرده؛ ۵) کوه؛ ۶) رموکی؛ ۷) رنگ آبی روشن؛ ۸) نام شهـری در کردستان؛ ۹) پسوند تصغیر؛ ۱۰) کجا؛ ۱۱) اندوه؛ ۱۲) کُند، مخالف تیز؛ ۱۳) اجتماع؛ ۱۴) بلکه، شاید.

**کوٗ:** ۱) چلوٚن، چوٚن، چاوان؛ ۲) کام‌جێ؛ ۳) کە: (کـو ئەڤها بت)؛ ۴) چیا، کێف، کێو؛ ۵) کوٗلەکە، کدو ف ۱) چطور؛ ۲) کجا؛ ۳) کە؛ ۴) کوه؛ ۵) کدو.

**کوا:** ۱) لەکام جێ‌یە؟؛ ۲) کامەیە؟ ف ۱) کجا است؟؛ ۲) کدام است؟.

**کواتر:** کوٚتر، کەموتەر، کەڤوٚك ف کبوتر.

**کوارْ:** ۱) دەفـری گەورەی گڵینی دەخـڵ و ئارد؛ ۲) پلوٗرەهـەنـگ، خەڵێفەمێش ف ۱) کندوی غلّه؛ ۲) کندوی زنبور عسل.

**کوارگ:** قارچ، کارگ، کڤارگ ف قارچ.

**کوارە:** ۱) کوارْ؛ ۲) باجی ئاغا لەسەر خەڵیفەمێشان ف ۱) کندوی غلّه؛ ۲) سهم ارباب از عسل رُعایا.

**کواکو:** زوٚر زیاد ف فراوان.

**کوان:** ۱) دومەڵ؛ ۲) قول، کنا؛ ۳) لە کام جێگەن؟؛ ۴) کامانەن؟ ف ۱) دُمَل؛ ۲) سوراخ؛ ۳) کجایند؟؛ ۴) کدامند؟.

**کواناکەش:** کوٚڵەوەژ ف نیم‌سوز تنور.

**کوانْك:** تفك، ئاگردان ف اجاق.

**کوانْگ:** کوانْك ف اجاق.

**کوانو:** کوانْك ف اجاق.

**کوانێ:** ۱) لە کام شوێنە؟؛ ۲) کامەیە؟ ف ۱) کجا است؟؛ ۲) کدام است؟.

**کوانی‌خورما:** دومەڵێکە لە دەم‌و چاو دێت تا ساڵێك چاك نابێتەوە ف سالك.

**کواوا:** گونـدێکی کوردستـانـە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**کوای:** ۱) لێدان؛ ۲) لە کام شوێنی؟ ف ۱) زدن؛ ۲) کجا هستی؟.

**کوایش:** ۱) دارکاری کردن؛ ۲) نەقیزەتێ‌وەژاندن ف ۱) چو بکاری؛ ۲) سیخونك زدن.

**کوبار:** ۱) مروٚی بەحورمەت، بەڕێز؛ ۲) سەرەتای‌هەرشتێ لە بەروبوٗی زەمین ف ۱) باوقار، محترم؛ ۲) سرآغاز بهره‌دادن زمین.

**کوباری:** کوبار، نوٚبەرە ف نو بر.

**کوٚباژێڕ:** بازاڕی بەشەریکی چەند کەسێك ف بازار مشترك.

**کوٚبایی:** نرخی بەجوملەفروٚشی ف نرخ عمده‌فروشی.

**کوبرا:** ناوی ژنانە ف نام زنانە.

**کوٚبوٗن:** لێك‌خڕ بوٗنەوە ف جمع شدن.

**کوٚبوٗنەوە:** لێك‌خڕ بوٗنەوە ف جمع شدن.

**کوٚبە:** قەراغی دادرواو ف سجاف.

**کوٚپ:** ۱) دوندی چیا، تروٚپکی کەژ؛ ۲) بالاترین شوێن ف ۱) قلهٔ کوه؛ ۲) اوج.

**کوٗپ:** ۱) فینـجـان؛ ۲) دەفـری دەم‌ئاواڵـە لە سواڵـەت؛ ۳) کپ، بێدەنگ‌ومات ف ۱) فنجان؛ ۲) خُم؛ ۳) بی سر و صدا.

**کوٚپابەخت:** ئەوپەڕی بەختەوەری ف نهایت خوشبختی.

**کوٚپار:** ۱) تێلای سەرنەستوٗر؛ ۲) دوٗگی وشتر ف ۱) چو بدست سرگنده، چماق؛ ۲) کوهان.

**کوٚپارە:** ۱) زوٚپایی ملی گا؛ ۲) ناو چیا؛ ۳) دوٗگی وشتر ف ۱) برامدگی پشت گردن گاو؛ ۲) کوهساران؛ ۳) کوهان شتر.

**کوٚپاڵ:** ۱) کوٚپار، تێلای سەرنەستوٗر؛ ۲) داردەستی سەرچەماو، گوٚچان ف ۱) چماق سرگنده؛ ۲) چوگان.

**کوٚپان:** پالان ف پالان.

**کوٚپـانـە:** ۱) زەقـایی ملی گا؛ ۲) جوٚرێ نەخـوٚشی وڵاخـەبەرزە؛ ۳) تیـسـکەخوری سەرپشتی حەیوان کەنای‌بڕنەوە؛ ۴) دوٗگەوشتر ف ۱) برجستگی پشت گردن گاو؛ ۲) نوعی بیماری ستور؛ ۳) پشمی که بر پشت گوسفند می‌ماند و چیده نمی‌شود؛ ۴) کوهان شتر.

**کوٚپتـان:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**کوٚپێك:** پیلوٗی چاو ف پلك چشم.

**کوٚپڵ:** لاوازو داڵگوٚشت ف لاغر مردنی.

**کوپ‌لخ:** سێ‌پایەی کوٗپەئاو لەسەردانان ف سەپایهٔ خم آب.

**کوٚپنگـە:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**کوٗپـە:** ۱) کوٗپ، دەفـری زەلامی سواڵـەتی؛ ۲) کوٚگیای لەسـەریەك دانـدراو؛ ۳) کەڵـەشـاخی حەجـامات؛ ۴) خاڵێکی سوٚرە لە پەڕی قوماردا ف ۱) خُم؛ ۲) توده گیاه درویده؛ ۳) شاخ حجامت‌گیری؛ ۴) خالی در ورق‌بازی، دل.

**کوٚپەڕ:** پوشپەڕ، جەنگەی گیادروٗن ف موسم درو گیاه.

**کوٚپەڕە:** ئەستوٗرایی دەورەی شت ف قُطر.

**کوٗپەرە:** کوٗپەی پچوٗگ، بستوگە ف خُم کوچك.

**کوٚپـەك:** ۱) بەری داربـەڕوٗ؛ ۲) تروٚپکی چیا؛ ۳) قارەمـان ف ۱) ثمر بلوط؛ ۲) قلّهٔ کوه؛ ۳) قهرمان.

**کوٚپەلان:** پالان، کوٚپان ف پالان.

**کوٗپەلوٚکە:** کوٗپەی زوٚر پچوٗك ف خُم بسیار کوچك.

**کوٗپەلە:** ۱) کوٗپەی پچوٗك؛ ۲) گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف ۱) خُم کوچـك؛ ۲) نام روستـایی در کردستـان که توسط بعثیان ویران شد.

**کوٚپەلێن:** پالان، کوٚپان ف پالان.

**کوپیان:** هێدی، ئارام ف آرام.

**کوٚپیتە:** پوٚپە ف تاج خروس و مرغ.

**کوپین:** ئارام‌گرتن، هەدادان ف آرام گرفتن.

**کوت:** ۱) پاژ، پارچە؛ ۲) لێدان، قوت، قوتان؛ ۳) وشەیەکە لە هەڵبژاردنی تاکێك بوٚ بازی:(شیر و کوت)؛ ۴) پاشگـری بەواتـا: کەسێ کە

سر بریدن؛ ۲) کشتن قاتل، قصاص.

**کوشتو:** ۱) کوژراو؛ ۲) سەربڕاو ف ۱) کشته؛ ۲) سر بریده.

**کوشتوخ:** زۆربکوژ ف آدمکش حرفه‌ای.

**کوشته:** ۱) کوژراو؛ ۲) قسڵی ئاوتێکراو بۆ سپی کاری ماڵ ف ۱) کشته؛ ۲) آهك مرده.

**کوشتەرا:** ڕەندەی دارتاشی ف رندهٔ نجّاری.

**کوشتەرە:** کوشتەرا ف رندهٔ نجّاری.

**کۆشش:** تەقالا ف کوشش.

**کۆششت:** کۆش، کۆشش ف کوشش.

**کۆشك:** ۱) قەسر؛ ۲) شەربەی سواڵەت ف ۱) کاخ؛ ۲) لیوان سفالین.

**کوشـك:** ۱)دەڵەك؛ ۲) مەلێکی بچوکە لە شێوەی پەرەسێلکەکە لەسەر ڕەڵم هێلانـە دەکـا ف ۱) نگا: دەڵەك، حیوانی با پوست قیمتی؛ ۲) پرنده‌ای است.

**کۆشکار:** پینەچی ف پینه‌دوز.

**کۆشکە:** ۱) قەڵاخ، تەپاڵە، دەوە؛ ۲) جۆرێ هەرمێ؛ ۳) کروشمە ف ۱) تاپاله؛ ۲) نوعی گلابی؛ ۳) کزکردگی.

**کۆشکەرە:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**کۆشکەلاتن:** کروشمەکردن ف کزکردن.

**کۆشکەلاتو:** کروشمەکردگ ف کزکرده.

**کۆشکەلان:** ۱) قەڵاخدان، تەپاڵدان؛ ۲) سەرانگوڵك ف ۱) تاپاله‌دان؛ ۲) شوله.

**کۆشکەلی:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**کۆشکێ:** دوگونـدی کوردستـان بەم ناوە بەعسی کاولی کردوە ف دو روستا به این اسم در کردستان توسط بعثیان ویران شده است.

**کوشمـە:** ۱) وشکـەمیوەی تێکـەڵکراوی کوتـراو بۆ بـەرمیوانـان؛ ۲) قەزوانی فەریکی کوتـراو بو پێخـوری زستان هەڵگیراو ف ۱) و ۲) نگا: گوشمه.

**کوشن:** کزن، دانەوێڵەیەکە. *گای پێ قەڵەودەبێ* ف از غلات.

**کوشندە:** هەرچی جانەوەر بکوژێ ف کشنده.

**کوشننە:** کوشندە ف کشنده.

**کوشنە:** کوشن، کزن ف کرسنه، یکی از حبوبات.

**کۆشە:** ۱) کۆششت، تەقالا؛ ۲) تەپاڵە؛ ۳) گۆشە، سوچ، قوژبن ف ۱) کوشش؛ ۲) تاپاله؛ ۳) گوشه، زاویه.

**کۆشەش:** خەبات، تەقالا ف کوشش.

**کۆشەلان:** کۆشکەلان ف نگا: کۆشکەلان.

**کۆشەوە:** کۆششت ف کوشش.

**کۆشیار:** ۱) بەکار؛ ۲) ڕەنجدەر، تاقالاکەر ف ۱) کارا؛ ۲) ساعی.

**کوشین:** لە ناو چنگا پشاوتن ف فشردن.

**کۆشین:** کۆشان ف کوشیدن.

**کوف:** ۱) دەنگی شتی نەرم وەك هەویر کە دەخرێتە سەر پنە؛ ۲) دەنگی هەنـاسـەدانی بەقـەوەت؛ ۳) خۆهەڵکێشان و پف بەخۆداکردن ف ۱) صدای افتـادن شییء نرم و خمیری؛ ۲) صدای نفس عمیق؛ ۳) از خودگفتن و به خود مباهات کردن.

**کوفار:** کافران، خوانەناسان ف کُفّار.

**کوفارە:** فیچقە، فوارە، کفارە ف فوّاره.

**کوفاری:** سەربەکوفار ف منسوب به کفّار.

**کوفاندن:** ۱) بەدورێز دروون؛ ۲) پەراوێز دەکنج گرتن؛ ۳) وششەی مار ف ۱) با سوزن دوختن؛ ۲) حاشیه‌گرفتن؛ ۳) صدای مار.

**کوفت:** کفت، شەکەت ف کوفته، خسته.

**کوفتە:** کفتە ف کوفتهٔ خوراکی.

**کوفتیك:** کرمیت، گۆگرد، شەمچە ف کبریت.

**کوفر:** ۱) خوانەناسین؛ ۲) دژون، جوێن، دژمێن ف ۱) کفر؛ ۲) دشنام.

**کۆفرۆش:** بازرگانی بەرانبەری وردەفرۆش ف عمده‌فروش.

**کوفریت:** شەمچە، شخارتە ف کبریت.

**کوففك:** گەنیو ف گندیده.

**کوففکبوُن:** گەنین ف گندیدن.

**کوففین:** وششاندنی مار ف صدا از خود درآوردن مار.

**کوفك:** ۱) ڕەحەتی، راحەتی؛ ۲) کەمێڵە، چڵمی وشکەوبوُگ لە لوُتا؛ ۳) برش، کەڕوُ؛ ۴) قرپ ف ۱) قیف؛ ۲) خلم خشکیده در بینی؛ ۳) کفك؛ ۴) آروغ.

**کوفکارك:** ۱) کارگی دەشت؛ ۲) دونبەلان ف ۱) قارچ دشتی؛ ۲) دُنبلان.

**کوفکی:** ۱) چڵمی وشکەوەبوُگ لە کەپوُدا؛ ۲) کەڕو لێ‌دراو ف ۱) خلم خشکیده در بینی؛ ۲) کَفَك‌زده.

**کوفـل:** گونـدێکی کوردستـانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**کوفلەت:** ماڵ و خێزان، ماڵ و مناڵ ف اهل و عیال.

**کوفلی:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**کوفلینـگ:** گونـدێك لە کوردستـان کە بەعسی بە بومبـای شیمیایی خەڵکیان کوشتوەو پاشان کاولیان کردوە ف روستایی در کردستان که مردمش توسط بعثیان با بمب شیمیایی قتل عام شده و سپس ویران گشته است.

**کوفه کوف:** ۱) واقەی کەروێشك؛ ۲) دەنگی هەڵچوُنی تراو لەسەر ئاگر ف ۱) صدای خرگوش؛ ۲) صدای رفتن مایع بر آتش.

**کوفەنی:** ۱) بوڵەبوڵ؛ ۲) پرخەپرخ ف ۱) غر ولند؛ ۲) خُرویُف.

**کوفی:** ۱) کوُپـە؛ ۲) بوڵـەو پرتە؛ ۳) دەنگی پرخە ف ۱) خُم، سبوی بزرگ؛ ۲) غرولند؛ ۳) خُرویُف.

**کۆفی:** ۱) جۆرێ سەرپۆشی ژنانە؛ ۲) تاسکڵاوی ژنان، کڵاوزێڕ ف ۱) نوعی سرپوش زنانه؛ ۲) نوعی کلاه زنانه.

**کۆفی کێل:** کڵاولار، شەدەلار ف کج کلاه.

**کوفێری:** کفر، دارێکی دەوەنە ف از درختان جنگلی.

**كوڤ:** كوم، قەمبوُر، كوُڕ ف كوژپشت.

**كوُڤ:** كوم، پشت چەمیاگ ف كوژپشت.

**كوڤار:** ڕۆژنامەی حەوتوانە یان مانگانە ف مجلّە.

**كوڤان:** ١) خەم، خەفەت، عەزرەت؛ ٢) كوان، دومەڵ؛ ٣) گلێنەی چاو ف ١) اندوه؛ ٢) دمل؛ ٣) مردُمك چشم.

**كوڤرك:** جۆرەكارگێكەلەناوچیمەن‌دەڕوێ ف گیاهی است.

**كوڤك:** ١) كوفك. ڕەحەتی؛ ٢) ئەنگوستیلەی درومان؛ ٣) كونای‌قنگ؛ ٤) هەرچی‌وەك‌ڕەحەتی بێ؛ ٥) چڕوچاوی‌بەكەندوكلۆ ف ١) قیف؛ ٢) انگشتانە؛ ٣) سوراخ مقعد؛ ٤) مخروطی شكل؛ ٥) ترشروی

**كوڤل:** ١) كۆتەرەدار؛ ٢) پشت‌چەماو ف ١) كندهٔ درخت؛ ٢) كوژپشت.

**كوُڤە:** بۆ كام جێ؟ ف به كجا؟

**كوڤی:** حەیوانەكێوی ف بزكوهی.

**كوڤیتی:** بریتی لە نەفامی ف توحّش.

**كوك:** ١) قەڵاندۆش؛ ٢) بەقیمەت، بایی‌دار ف ١) قلمدوش؛ ٢) ارزشمند.

**كوٚك:** ١) تەقەڵی درشت، باقیه؛ ٢) پۆشتە، جلك‌تازە؛ ٣) قەڵەو؛ ٤) سازو دڵخۆش؛ ٥) دەركەوان؛ ٦) قورمیشی سەحات؛ ٧) ڕەگ‌و ڕیشە؛ ٨) بیانـو، بەهانە، پەڵپ؛ ٩) بنیچەو ڕەسەن؛ ١٠) نێوان‌خۆش: (پێكەوە كوٚكن)؛ ١١) پاشگـری پچـوُك‌شانـدان: (كچكـوٚك)؛ ١٢) ڕازاوە، خۆجـوان‌كردو ف ١) كوك خیّاطـی، بخـیهٔ درشـت، بخـیه؛ ٢) خوش‌پوش؛ ٣) چاق؛ ٤) سرحـال؛ ٥) دربان؛ ٦) كوك ساعت؛ ٧) ریشه و شالوده؛ ٨) بهانه؛ ٩) نژاد، اصل؛ ١٠) صمیمی؛ ١١) پسوند تصغیر؛ ١٢) آرایش كرده.

**كوُك:** كەڵەشێر، كەڵەباب، دیقل ف خروس.

**كوٚكردن:** ١) سڵەمینەوە؛ ٢) خڕكردنەوەی بڵاو؛ ٣) لەسەریەك‌دانان ف ١) رمیدن؛ ٢) جمع كردن پراكنده؛ ٣) برهم انباشتن.

**كوٚكردنەوە:** خڕكردنەوەی پرژو بڵاو ف جمع كردن پراكنده.

**كوٚك‌كردن:** ١) قورمیش‌كردنی سەحات؛ ٢) تەقەڵی درشت‌لێدان ف ١) كوك كردن ساعت؛ ٢) بخیهٔ درشت زدن.

**كوٚك‌گرتـن:** ١) پەڵپ‌بەستن؛ ٢) بە تەقـەڵی درشت درونـەوە ف ١) بهانه‌گیری؛ ٢) بخیهٔ درشت‌زدن.

**كوٚكلاش:** گیایەكە ف گیاهی است.

**كوٚكلە:** لێك‌پێچراوی دەزو، جۆرێ كلاف ف گروهەنخ، نوعی كلاف.

**كوُكلە:** بوُكەڵەی زارۆكان، وەوی منالان ف عروسك.

**كوٚكم:** ١) گێل‌و حوڵ؛ ٢) بێ‌ئەنواو دەربەدەر ف ١) هالو؛ ٢) بی‌خانمان.

**كوٚكمە:** پیرو زورهانی لەكەڵك‌كەوتوُ ف پیر و از كار افتاده.

**كوٚكمەنی:** پیری‌و زورهانی ف پیری و كُهنسالی.

**كوٚكنایش:** ئاوازی خۆشی مەلان ف صدا و نوای خوش پرندگان.

**كوٚكنـدار:** مەلێكـە لەكەو زلترەو لەكەو ئەكاوڕەنگی زەردە ف پرنده‌ای شبیه كبك.

**كوكو:** ١) كۆترەباریكە؛ ٢) هێلكەوڕۆنی بەپنگە؛ ٣) دەنگی كوندەبو؛ ٤) خوێندنی كوترەباریكە ف ١) قمری؛ ٢) غذای كوكو؛ ٣) صدای بوم؛ ٤) آوای قمری.

**كوكوختی:** كۆترەباریكە ف قمری.

**كوكورد:** گۆگرد، كانزایەكی زەردەو زوُئاگرئەبا ف عُنصر گوگرد.

**كوكوٚس:** نەرگیلە، نێرگەلە، قلیاناوی ف قلیان.

**كوكە:** ئاژاوەو پشێوی ف آشوب و بلوا.

**كوٚكە:** ١) قف، كۆخە؛ ٢) گوندێكی كوردستانە بەعسی كاولی كرد؛ ٣) وشەی چوُك‌شاندان: (ئەوەندكوٚكە) ف ١) سرفه؛ ٢) نام روستایی در كردستان كه توسط بعثیان ویران شد؛ ٣) كلمهٔ تصغیر.

**كوُكە:** ١) قوُقوُی دیكل؛ ٢) وشەی چوُك‌شاندان: (ئەوەندكوُكە) ف ١) صدای خروس؛ ٢) كلمهٔ تصغیر.

**كوٚكەڕەشە:** قوڕەڕەشە ف سیاه‌سرفه.

**كوٚكەری:** گوندێكی كوردستانە بەعسی كاولی كرد ف نام روستایی در كردستان كه توسط بعثیان ویران شد.

**كوٚكـەل:** ١) پەپـوسلێمانە؛ ٢) جۆرێ حەیوانەكێوی، كەڵەكێوی؛ ٣) بریتی لە ئازا؛ ٤) گردی‌قوچ، تەپـەی بڵنـدی وەك كەلـەقەند ف ١) هدهد؛ ٢) كل كوهی؛ ٣) كنایه از شجاع؛ ٤) تپّهٔ بلند كلّه‌قندی.

**كوٚكـەن:** ١) ئالیك‌بڕین لە یەكسم؛ ٢) چیاكەن؛ ٣) ئازناوی فەرهادی شیرن ف ١) از علیق بازداشتن ستور؛ ٢) كوه‌كن؛ ٣) لقب فرهاد.

**كوٚكەنار:** بەری گیایەكە بۆ دەرمان دەشێ ف كوكنار.

**كوٚكی:** ١) بنەڕەتی، عەسلی؛ ٢) پۆشتەیی؛ ٣) دەماخ‌چاخی؛ ٤) كاری ڕابردوی قفین؛ ٥) خەڵكی دێی كوٚكە: (مەلامارفی **كوٚكی** شاعیری چاك بو)؛ ٦) نێوان‌خۆشی، تفـاق؛ ٧) مەلێكی‌پچـوُكـە لەدەسـەی چویلەكان ف ١) اساسی، شالوده‌ای؛ ٢) خوش‌پوشی؛ ٣) تردماغی؛ ٤) سرفه‌كرد؛ ٥) اهل روستای «كوٚكە»؛ ٦) صمیمیّت؛ ٧) پرنده‌ای از تیرهٔ گنجشكان.

**كوُكی:** كوكو، خاوڕۆنی بە پنگە ف خاگینه، كوكو.

**كوٚكی‌ئەمیران:** گونـدێكی كوردستـانـە بەعسی كاولی كرد ف نام روستایی در كردستان كه توسط بعثیان ویران شد.

**كوٚكین:** قفین، كۆخین ف سرفه‌كردن.

**كوٚگا:** ١) بەسەریەك‌داكراو؛ ٢) دوكانی وردەواڵە ف ١) برهم انباشته؛ ٢) مغازه.

**كوٚگـابـازی:** بازی خۆڵ بەسـەریەكـا كردن، كۆخاك دروس‌كردن ف خاكبازی كودكان.

**كوٚگادان:** بەسەریەكادانان ف برهم انباشتن.

**كوٚگرد:** گشت، تێكڕا، تێكڕایی ف روی هم، همگی.

**كوٚگە:** ١) عەمار، عەنبار؛ ٢) كام جێ؟ ف ١) انبار؛ ٢) كجا؟.

**كوٚگەوان:** عامباردار ف انباردار.

**كول:** ١) تیخێ كە نابڕێ؛ ٢) چاوی بەژان: (چاڤێ مْ **كول** بوُیە)؛ ٣) خەم، خەفەت؛ ٤) بریندار؛ ٥) ئێش‌و ئازار؛ ٦) شەكەت، فل؛ ٧) ئاهۆ، درم؛ ٨) هەمـوُ تێكڕا؛ ٩) خواردنی بێ ئیجازە، ناخونك؛ ١٠) تەڕاد، بەتالایی لای‌سەروی ڕان ف ١) تیغ كُند؛ ٢) چشم بیمار؛ ٣) اندوه؛

۴) زخمی؛ ۵) درد و آزار؛ ۶) خستهٔ کوفته؛ ۷) وبا؛ ۸) همه، کُلّ؛ ۹) ناخنك به خوراکی؛ ۱۰) کشالهٔ ران.

**کوڵ**: ۱) قوڵ، قوڵە، کۆتا؛ ۲) باڵاف؛ ۳) قوڵتی ئاو؛ ۴) بێ کلك، بێ‌دو؛ ۵) خەفەت؛ ۶) بەدزیەوە گوێ لەقسەی خەڵك گرتن [ف] ۱) کوتاه؛ ۲) نگا: باڵاف؛ ۳) جوشش آب؛ ۴) بی‌دُم؛ ۵) اندوه؛ ۶) استراق سمع.

**کۆڵ**: ۱) ئاوەخۆرەی ئاژەڵ لە دار یان لە بەردو قوڕ؛ ۲) قەمتەرە، قەم؛ ۳) تەشتی دارینی زۆر زلی نانەوا بۆ هەویر؛ ۴) پلۆسکی گەنم لە ئاسیاوا؛ ۵) خەڵیفــەمێش کە هەمــوی کلۆرایی داربێ‌و براِبێ؛ ۶) پێوانــەی دەخڵ لە دار کە شازدە کیلۆ دەبا؛ ۷) تێلەکە؛ ۸) پاشگر بەواتا: کەسێ زەوی دەداتەوە؛ ۹) بریقەی شاڵ‌و بوزو؛ ۱۰) رووت، بۆ سەر دەگوترێ: (سـەرکـۆڵ)؛ ۱۱) خێشك؛ ۱۲) چین، توێ [ف] ۱) آبشخور دام از چوب یا سنـگ؛ ۲) پل ناودانی؛ ۳) ناوهٔ خمیر؛ ۴) گلوی آسیا؛ ۵) کندوی عسل از تنهٔ توخالی درخت؛ ۶) پیمانهٔ چوبی غلّه به ظرفیّت شانزده کیلو؛ ۷) کوله‌پشت؛ ۸) پسوندبه معنی کاونده؛ ۹) درخشش پشم؛ ۱۰) برهنه ویژهٔ سر؛ ۱۱) نگا: خێشك؛ ۱۲) تا، شکن.

**کۆل**: ۱) تەشتی نانکـەران؛ ۲) پێڵە؛ ۳) فیلی شەترنج؛ ۴) تەویلە؛ ۵) زاخە؛ ۶) ئەشکەوت [ف] ۱) ناوهٔ خمیر؛ ۲) اُریب؛ ۳) فیل شطرنج؛ ۴) اصطبل؛ ۵) زاغه؛ ۶) غار.

**کۆڵ**: ۱) تێلەکە؛ ۲) سەرشان، قەڵاندۆش؛ ۳) ئاژەڵی بێ شاخ؛ ۴) قامك‌پەڕیو؛ ۵) بێچوی دڕندەو ئاسك؛ ۶) دەرزی‌و سوژنی نوك‌پەڕیو؛ ۷) پاشگـر بەواتـا: کەسێ کە زەوی دەداتـەوە؛ ۸) گیایەکی دەشتـە دەخـورێ؛ ۹) خاو، پوخت‌نەبـوگ؛ ۱۰) کاڵ، کرچ؛ ۱۱) برێتی لە ناشـارەزا لە کار؛ ۱۲) رەبـەت، سیپـە؛ ۱۳) مستەکۆڵە، مشت؛ ۱۴) بەرێك‌لەبەرەکانی دارمازو [ف] ۱) کوله‌پشت؛ ۲) میان شانه، قلمدوش؛ ۳) حیوان بی‌شاخ؛ ۴) انگشت بریده؛ ۵) بچهٔ درنده و آهو؛ ۶) سوزن نُك شکـسته؛ ۷) پسوند به معنی کاونده؛ ۸) گیاهی است خوردنی؛ ۹) خام، ناپختــه؛ ۱۰) کال، نارس؛ ۱۱) کنـــایه از ناشی؛ ۱۲) کمین شکارچی؛ ۱۳) مُشت؛ ۱۴) از محصولات مازو.

**کولا**: ۱) برین وەژان‌کەوت؛ ۲) جۆشیا، قوڵتی دا [ف] ۱) زخم باز به درد آمد؛ ۲) جوشید.

**کوڵا**: جۆشی خوارد، قوڵتی دا [ف] جوشید.

**کۆڵا**: ژنی بەپارە کڕدراو [ف] کنیز زرخرید.

**کۆلا**: هەیوانی لە شوڵ‌و قامیش [ف] کپر.

**کولاب**: ۱) قولاپ؛ ۲) چنگوڕك [ف] ۱) قلّاب؛ ۲) چنگال.

**کولابـە**: ۱) دو داری سەر نیر کە دەچتـە ملی گاجـوتەوە، کەڵەوە؛ ۲) ڕیشەی ددان، ڕەگی‌دران [ف] ۱) چوب گردن بند گاو هنگام شخم زدن؛ ۲) ریشهٔ دندان.

**کولات**: ۱) کڵۆگڵ؛ ۲) تۆپەڵەبەفر [ف] ۱) کلوخ خاك؛ ۲) گلولهٔ برفی.

**کوڵاتگ**: جۆشیاو، تراوێ کە لەسەر ئاگر قوڵتی داوە [ف] جوشیده بر آتش.

**کوڵاتن**: جۆشیان [ف] جوشیدن.

**کۆلارە**: ۱) کۆرکـۆرە، باڵنـدەی جوچـك‌و مریشك‌ڕفێن؛ ۲) بادەوەی لەکاغەز، تەیارەی کاغەزی؛ ۳) گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد [ف] ۱) پرندهٔ جوجه‌رُبا؛ ۲) هواپیمای کاغذی؛ ۳) نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**کوڵاژدم**: کڵاشدم، دوپشك [ف] عقرب.

**کولاف**: چرنۆکی باڵدار [ف] پنجهٔ پرنده.

**کولافك**: قارچ، کارگ [ف] قارچ.

**کولافە**: ۱) بێ‌تاقەت‌و توان؛ ۲) کار لەدەست‌نەهاتگ [ف] ۱) ناتوان؛ ۲) ناشی، بیکاره.

**کولافی**: چڵێس، زگ‌لەوەڕێن [ف] آزمند در خوراك، شکم‌پرست.

**کولاڤ**: ۱) رایەخ لە پەستاوتوی بەرگن؛ ۲) کڵاوی لە بەرگنی پەستواو؛ ۳) فەرەنجی [ف] ۱) نمد زیرانداز؛ ۲) کلاه نمدی؛ ۳) نمدپوشیدنی.

**کولاڤە**: کەڵەوەی ملی گاجوت [ف] یوغ گردن گاو شخم‌زنی.

**کولان**: کڵاوڕۆچنە، ڕۆچنەی سەربان [ف] روزنهٔ پشت‌بام.

**کوڵان**: ۱) جۆش‌هاتـنـی ئاو؛ ۲) پوخـت‌بونی شتی خاو [ف] ۱) جوش آمدن؛ ۲) پخته‌شدن خام.

**کۆڵان**: ۱) کوچە؛ ۲) زەوی‌دانەوە؛ ۳) تێلەکەی زۆر: (نۆکەری خەڵکی عەیبـە لەبـۆ مە/**کـۆڵان** هەڵبگـرین بە کۆمەکۆمە) «سەیف» [ف] ۱) کوچه؛ ۲) کاوش؛ ۳) کوله‌پشتها.

**کولانـا**: گونـدێکـە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد [ف] از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**کولانچکە**: ڕۆچنە [ف] روزنه.

**کولاندن**: وەژان‌هێنانی برین‌و کوان [ف] به دردآوردن زخم و دمل.

**کوڵاندن**: ۱) جۆش‌پێ‌هێنانی تراو؛ ۲) پێ‌گەیاندنی خاو لە جۆشیاودا [ف] ۱) جوشانیدن؛ ۲) پخته‌کردن در آب جوش.

**کولانـدنـەوە**: دوای ئارامی‌و ژان‌نەکردن وەژان‌خستنەوەی برین [ف] به دردآوردن زخم بعد از تسکین.

**کوڵانـدنـەوە**: دوبارە جۆش‌پێ‌هاوردن: (دۆ **دەکوڵێنمەوە** کەشکی لێ دەگرم) [ف] بازجوشانیدن.

**کۆڵانکوت**: برێتی لە کەسێ کە زۆر بە ناو ئاواییدا دەخولێتەوە [ف] کنایه از کسی که بسیار در کوچه‌ها می‌گردد، کوچه‌گرد.

**کولانکە**: ڕۆچنە [ف] روزنه.

**کوڵانگ**: کوڵاندن، جۆش‌پێ‌هاوردن [ف] جوشانیدن.

**کۆڵانگەر**: کۆڵانکوت [ف] نگا: کۆڵانکوت.

**کوڵانن**: کوڵاندن [ف] جوشانیدن.

**کولاننەوە**: کولاندنەوە [ف] نگا: کولاندنەوە.

**کوڵاننەوە**: کوڵاندنەوە [ف] بازجوشانیدن.

**کولانە**: ۱) ڕۆچنە؛ ۲) قن، کوڵێتی مریشکان [ف] ۱) روزنه؛ ۲) لانهٔ ماکیان.

**کولانەوە**: وەژان‌هاتنەوەی برین [ف] بازبه درد آمدن زخم.

**کۆڵانەوە**: ۱) زەوی‌دانەوە؛ ۲) تۆژینەوە لە کارو بار [ف] ۱) کاوش کردن؛ ۲) پژوهش.

**کۆلاو**: گەرمەشین، خەمی گەورە [ف] اندوه گران، غم بزرگ.

**کولاو:** تەرداس، تەوەرداس ف داس چوب بری.

**کوڵاو:** ۱) جۆش هاتگ؛ ۲) پوختەبوگ لە ئاوی جۆشیەدا؛ ۳) کڵاو؛ ۴) بریتی لە دنیادیده ف ۱) جوشیده؛ ۲) پخته‌شده؛ ۳) کلاه؛ ۴) کنایه از دنیا دیده.

**کولاوکه:** رۆچنەی سەربان ف روزنهٔ بام.

**کوڵاورۆچنه:** کڵاورۆچنه ف روزنهٔ بام.

**کوڵاوروژنه:** کولانکه ف روزنه.

**کولب:** ۱) قاتی؛ ۲) نەوسن، چڵێس ف ۱) قحطی؛ ۲) شکم‌پرست.

**کولبزك:** گوڵەنەورۆزه ف از گُلهای بهاری.

**کولبوُن:** ۱) لەتیژی کەوتنی تیخ؛ ۲) وەژان‌هاتنی چاو؛ ۳) پەنەمانو ئێشانی ئەندام ف ۱) کندشدن تیغ؛ ۲) به دردآمدن چشم؛ ۳) آماسیدن و درد اندام.

**کولبه:** ۱) بێڵوکەی ئاسن، بێڵچه؛ ۲) کار لەباغچەداکردن بەپاچو بێڵچه ف ۱) بیلچه؛ ۲) با بیلچه و کلنگ در باغچه کارکردن.

**کۆڵبەند:** تێلەکه ف کوله‌پشتی.

**کولبەوی:** چڵێس، کولافی ف شکم‌پرست.

**کولپ:** ۱) قورسی، سەنگینی؛ ۲) بەڵاو نسیبەت؛ ۳) قاتیو قڕی؛ ۴) گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف ۱) سنگینی؛ ۲) بلا و مصیبت؛ ۳) قحط و غلا؛ ۴) نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**کولپەك:** هەنگڵی کوپەو بەرۆش، دەسکی کوپەو مەنجەڵ ف دستهٔ کوزه و امثال آن.

**کولپیچ:** کارپوچ، خشت ف خشت.

**کوڵ پێدان:** قوڵت بە تراوی سەرئاگر دان ف بەجوش آوردن.

**کۆڵ پێدان:** بەزاندن ف شکست دادن.

**کولپین:** دەنگو شەقەی لێدانی مشتو کوتەك ف صدای کُتك‌کاری.

**کولتەپه:** ناوی گوندێکە لە کوردستان ف نام دهی در کردستان.

**کولتەنه:** ۱) رەبەت، سیپه، بۆسه؛ ۲) لە سیپەدا رۆنیشتن ف ۱) کمین؛ ۲) در کمین نشستن.

**کوڵجه:** جۆرێ سوخمەی بەقۆڵ ف یلك آستین‌دار.

**کولچی:** هێلانەیمەل کە لەناو داردا کۆڵدراوه ف لانهٔ مرغ که از درخت کنده شده باشد.

**کولخان:** تۆنی حەمام ف کلخن، خزینهٔ حمّام.

**کوڵخواردن:** کولاّتن ف جوشیدن، جوش آمدن.

**کولدار:** ۱) دڵبەخەم؛ ۲) بریندار ف ۱) غمگین؛ ۲) زخمی.

**کوڵدان:** قوڵتدان ف غلغل کردن جوشان.

**کۆڵدان:** ۱) شەکەت‌بوُنو دەست‌کێشانەوە لە کار؛ ۲) تەسلیم‌بوُن ف ۱) خسته‌ونومیدشدن؛ ۲) تسلیم شدن.

**کولفا:** زۆر برسی ف بسیار گرسنه.

**کوڵفت:** کڵفت ف نگا: کڵفت.

**کوڵفەت:** کڵفەت ف نگا: کڵفەت.

**کۆڵفەمە:** هەوەڵ کوتانی چەڵتوُك بە دنگ ف برای بار اول کوبیدن شالی با دنگ.

**کولك:** موُی هەرەنەرمی ئاژەڵ کە دەکرێتە دەسکێشو گۆروا ف کُرك.

**کوڵك:** ۱) زۆر بەژان؛ ۲) ئاهوُ، پەتا، درم، ئازار؛ ۳) دومەڵ، کوان؛ ۴) چارداخ لە حەسیر و قامیش ف ۱) بسیار دردآور؛ ۲) وبا، بیماری عمومی؛ ۳) دُمل؛ ۴) آلاچیق.

**کوڵك:** ۱) هەرچی لەسەر پێست ئەڕوێ؛ ۲) خوری قرخ کە بەکاری رستن نایه، قرخن؛ ۳) موی نەرمی سەر پێست، کوُرو؛ ۴) توُش، دوچار: (کولکم بوه بە کولکیەوه)؛ ۵) زیپکه، زیرك ف ۱) پشم و موی؛ ۲) پشمی که به کار ریسیدن نمی‌آید؛ ۳) کرك؛ ۴) دچار؛ ۵) جوش پوست.

**کۆڵك:** ۱) پارچەداری ئەستوُر؛ ۲) بنجو رەگ؛ ۳) کەپر؛ ۴) داری نیشانەو ئامانجی جلیت‌بازی؛ ۵) زیپکەلەپێست ف ۱) کُنده؛ ۲) بیخ وریشه؛ ۳) کپر؛ ۴) کندهٔ آماج «جریت»بازی؛ ۵) جوش بر پوست.

**کوُڵك:** کولانەمریشك ف لانهٔ ماکیان.

**کولکا:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**کۆلکانه:** کلکەوانه، ئەنگوستیله، هەنگوسیلك ف انگشتری.

**کول کردن:** ۱) تیژی تیخو هەرچی تیژ نەهێشتن؛ ۲) پاڵدان، دەڵەکدان ف ۱) کندنمودن تیز؛ ۲) هول دادن.

**کوڵ کردن:** بالاّف کردن ف رخت شستن.

**کۆڵ کردن:** ۱) لەسەرپشت دانان؛ ۲) سەرنوُکی تیژ پەڕاندن؛ ۳) سەرپەنجە پەڕاندن ف ۱) کول کردن؛ ۲) نوكِ تیز چیزی را شکستن؛ ۳) انگشت بریدن.

**کوڵ کردنەوه:** بەکوّتایی بڕینەوەی قسەو مەبەست ف کوتاه‌کردن سخن.

**کوڵکن:** ۱) زۆر بەمو؛ ۲) تیر، دژی شلو تراو: (ماستاوێ **کوڵکن** بکه) ف ۱) پشمالو، پرمو؛ ۲) غلیظ.

**کولکنه:** دوگوندی کوردسان بەم ناوە بەعسی کاولی کردوه ف دو روستا به این اسم در کردستان توسط بعثیان ویران شده است.

**کوڵکنه:** کوڵکن ف نگا: کوڵکن.

**کولکوله:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**کوڵکوڵه:** فیچقه، کوفاره، قوڵقوڵه ف فوّاره.

**کولکولی:** ۱) رەنگی پەمەیی، چێرەیی؛ ۲) باڵندەیەکه ف ۱) رنگ صورتی؛ ۲) پرنده‌ایست.

**کول کولین:** رەنجدانو شەکەت‌بوُنی زۆرو بێ‌بەهره ف زحمت فراوان و بی‌ثمر کشیدن.

**کولکه:** دۆدانه، مەشکۆڵەی دۆتێکردن ف مشك دوغ و ماست.

**کوڵکه:** کوڵك، خوریو مو ف پشم و مو.

**کۆڵکه:** ۱) کۆڵك، داری ئەستوُر؛ ۲) بنجو ریشه؛ ۳) ناتەواو، کۆڵکه؛ ۴) گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف ۱) کُنده؛ ۲) ریشه‌وبن؛ ۳) ناتمام؛ ۴) نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**کۆلکــه:** ناتــەواو. وەپێش *ناوی کەســانێ دەکــەوێ کە وەك خۆیان شان‌دەدەن وا نین* : (**کــۆلکــە** پیاو، **کۆلکــە** شێخ، **کۆلکــە** مەلا) ف ناقص، ناتمام.

**کۆلکەر:** کەسێ کە بالآف دەکا ف رخت‌شوی.

**کۆلکــەر:** ۱) کولکــەر؛ ۲) کەسێ بە پشت شت دەگوێزێتــەوە ف ۱) رخت‌شو؛ ۲) کسی کە کولە پشت می‌برد.

**کۆلکــەڕن:** مۆ لەپێست‌کردنــەوە بە دەست، دەسکــەنەی مۆ ف موی برکندن با دست.

**کۆلکــەڕەش:** گونــدێکــە لە کوردستــان بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**کولکــەڕەشــە:** لەو گونــدانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان کە بعثیان آن را ویران کردند.

**کۆلکەڕەنگینە:** ئەستوونەزێڕنە، کەسکەسوور، پەلکەڕەنگینە، کێرستوون، پەلکەزێڕینە ف رنگین کمان.

**کۆلکەزێڕینە:** کۆلکەڕەنگینە ف رنگین کمان.

**کولکی ئەحمــەد:** گونــدێکی کوردستــانــە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان کە توسط بعثیان ویران شد.

**کولکی حەمــەســوور:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان کە توسط بعثیان ویران شد.

**کولکی سمایل‌خدر:** گــوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان کە توسط بعثیان ویران شد.

**کۆلکێش:** حەماڵ، کۆلکەر ف آدم باربر.

**کۆلگە:** ۱) ڕەبەت، بۆسە، سیپە؛ ۲) جێ کۆبوونەوەی ڕاوکەران لە دەوری یەك ف ۱) کمین شکار؛ ۲) جای اتراق شکارچیان.

**کۆلگێڕ:** چەرچی، کەسێ کەل‌و پەل بە کۆڵ دێنێ بۆ فرۆشتن ف پیلەور، فروشندهٔ دوره‌گرد.

**کوللان:** کلێنچکە، بەرنوکی دوگە ف دنبالهٔ دُنبه.

**کوللۆ:** کلۆ، کولە ف ملخ.

**کوللۆر:** کلۆر ف میان تهی.

**کوللوور:** ۱) پێنســەدهەزار؛ ۲) برێتی لە ئێجگار زۆر ف ۱) نیم میلیون، کرور؛ ۲) کنایە از بسیار زیاد.

**کوللە:** ۱) کلۆ؛ ۲) قومــاشی سپی تەنــك کە لە ترسی پێشکــە بە سەر تەختی نوستنی ڕادەنگێون ف ۱) ملخ؛ ۲) پشه‌بند.

**کوللەبــەجــەڕ:** برێتی لە کزو داڵگــۆشتی شل‌و شەوێق ف کنــایە از لاغراندام سست.

**کوللەحاجی:** تاژیلە، بالۆك، حوشترخوا ف آخوندك.

**کوللەزەردە:** کلۆی زەرد ف ملخ زرد.

**کوللەك:** ۱) تاژەڵێ کە لەبــەر گەجــەری‌و لاوازی ناچێتە ناو گەلە؛ ۲) شەل، شەلە، شلە ف ۱) دامی کە بە دلیل لاغری و بیماری داخل گلّە نشود؛ ۲) شَل، لنگ.

**کوللەکی:** ۱) لەجەری‌و لاوازی؛ ۲) شەلی، شەلیەتی ف ۱) لاغری؛ ۲) لنگی.

**کوللەمسکە:** کلۆی دەخڵ‌خۆر ف ملخ غلّه‌خور.

**کوللی:** تەواوی: (بە **کوللی** نامان دوێنێ) ف تمامی.

**کول لێدان:** بێ ئیجازە لە شتێ خواردن ف ناخنك زدن.

**کوللێرە:** ستورك، ئەستورك ف گرده‌نان.

**کولم:** ۱) پەنجەی قونجاو؛ ۲) پڕ بە یەك دەست؛ ۳) سیخورمە؛ ۴) خرمە ف ۱) مشت گره‌کرده؛ ۲) پُرکف دست؛ ۳) سقلمه؛ ۴) غرنبه.

**کوڵم:** ۱) کولم؛ ۲) سەرگۆنە، ڕوومەت ف ۱) نگا: کولم؛ ۲) گونهٔ رخسار.

**کول مال:** ماڵوێران، لێ‌قەوماو ف خانه‌خراب.

**کول مست:** بەپانایی‌و بەهێز لەخۆدانی ژنان ف با شدّت خود را زدن زنان.

**کول مشك:** جرج، مشکەکوێرە ف موش کور.

**کولمك:** مشتی گرێ‌کراو، مشتی قونجاو بۆ لێدان ف مُشت گره‌کرده.

**کولمۆز:** ۱) کونەزەرگەتە؛ ۲) کونەژنگەسوورە ف ۱) سوراخ زنبور؛ ۲) سوراخ زنبور قرمز.

**کولمول:** وردەوپردە، شڕوشاتاڵ ف خرت و پرت.

**کوڵمــە:** ۱) سەرگۆنــا؛ ۲) پارچــەگوشتی بێ‌هەستی ف ۱) گونــه؛ ۲) قطعه‌گوشت لخم.

**کولمەك:** کولمك ف مُشت گره‌شده.

**کولمیرۆ:** کونی مرۆچە ف سوراخ مورچه.

**کولمێرو:** نەخــۆشی‌و برینێ کە چاك نابێتــەوە ف بیماری یا زخمی که بهبود نیابد.

**کولن:** وەژان‌هاتنەوە، کولانەوە ف دوباره به درد آمدن.

**کوڵنــج:** ۱) کرچ‌و کاڵ؛ ۲) با دەنــاوشان‌وەستان، قوڵنج؛ ۳) ناوهەردو شان ف ۱) کال؛ ۲) بیماری قولنج؛ ۳) میانهٔ هردو کتف.

**کوڵنجان:** خوڵنجان، گیایەکە بۆ دەرمان دەشێ ف خولنجان، گیاهی است.

**کوڵنج شێلان:** ناوشان داماڵین ف مالیدن میان شانه‌ها.

**کوڵنج کردن:** با دەناوشان‌وەستان ف میان کتف به دردآمدن از سرما.

**کوڵنجگە:** نێوان هەردوك شان ف میان هردوشانه.

**کوڵنجە:** ۱) دانی دەخڵی فەریك؛ ۲) برێتی لە کچی تازەبێ‌گەیشتو ف ۱) دانهٔ غلّهٔ دلمل؛ ۲) کنایه از دختر نورسیده.

**کولنچی:** هێلانــەمــەلی کولــدراو لە داردا ف لانهٔ حك شده در درخت توسط پرنده.

**کولنــد:** ۱) کدو، کودی؛ ۲) کورتــەبــالای ڕەزاشیرین ف ۱) کدو؛ ۲) کوتاه‌قد تودل برو.

**کولندر:** کوڵەکە، کولند، کوندر ف کدو.

**کولندە:** کورتەبالای خوێن‌شیرین ف کوتاه‌قد دوست داشتنی.

**کولندەر:** کدو، کودی، کولند ف کدو.

**کوڵنــگ:** ۱) بەرێکی جەنگەڵی‌یە؛ ۲) نیمچەرفحەیەك لەدیواردا ف ۱) میوه‌ایست جنگلی؛ ۲) رف کوچك.

**کوڵنگ:** زەنگن ف کلنگ زمین کندن.

**کولو:** کلو ف نگا: کلو.

**کولۆ:** کلۆ، کوللە ف ملخ.

**کولۆ:** کلۆ ف کلوخ.

**کۆڵـوو:** ١) بنـەتاڵو، بێخی تاڵە کە بۆ سووتانی زستانە دەری دەهێنن؛ ٢) هەویری لە ناو تەندووردا سووتاو ف ١) ریشۀ گیاهی است کە بە جای هیزم بە کار می‌رود؛ ٢) خمیر سوختە در تنور، فرزدق.

**کۆڵوانە:** چارەکە، چارۆکە ف نگا: چارەکە.

**کولــۆت:** ١) بزنی بێ‌شاخ؛ ٢) ئاژەڵی بێ‌ددان ف ١) بُز بی‌شاخ؛ ٢) حیوان بی‌دندان.

**کوڵۆت:** کڵۆت ف نگا: کڵۆت.

**کولۆج:** جۆر، تەرز، کلۆج ف نگا: کلۆج.

**کولۆجە:** کوڵجە ف یلك آستین‌دار زنانە.

**کولوچە:** جۆرێ خواردنی لە هەویری ناوبەکاکڵە ف کلوچە.

**کولۆخ:** قەحفی سەر ف جمجمە.

**کولۆختە:** بەسەریەکدا قەڵاقوچکەبوگی بەردو چەوی دارژاو لە بڵندەوە ف تودۀ حاصل از ریزش کوە.

**کولۆخە:** کولۆختە ف نگا: کولۆختە.

**کولــۆر:** ١) کلۆر؛ ٢) جۆرێ کولێرەناسکە ف ١) میان تهی؛ ٢) نوعی نان گردە.

**کولۆور:** پێنسەدەهەزار، کوللوور ف نیم‌میلیون.

**کولۆورە:** پلوورە، شەڵخە، پوورە ف نسل نوین زنبور عسل.

**کولۆرە:** کوللێرە ف گردۀ نان.

**کۆڵۆز:** ١) کلێتە، کڵاوی لەبەن‌چندراو؛ ٢) کلۆز؛ ٣) رەق‌و تەق‌و کز ف ١) کلاەپشمی؛ ٢) کسی کە دندان پیشین ندارد؛ ٣) لاغر و بی‌نا.

**کولۆز:** کرووزەو نووزە ف لابەوزاری.

**کۆڵۆزبابە:** گیایەکە بۆ دەرمان دەشێ ف گیاهی است دارویی.

**کولۆزیانەوە:** کرووزانەوە ف نگا: کرووزانەوە.

**کۆڵۆس:** ١) کلۆز؛ ٢) ناوە بۆ پیاوان ف ١) نگا: کلۆز؛ ٢) نام مردانە.

**کولۆش:** جۆرێ جلکی ژنانە ف نوعی لباس زنانە.

**کوڵۆش:** کڵۆش ف ساقەهای غلّۀ دروشدە.

**کوڵۆشە:** کڵۆش ف نگا: کڵۆش.

**کوڵۆف:** لە ناو دەستا چرچاو ف مُچالە.

**کوڵۆفت:** کڵفت ف کُلُفت.

**کوڵۆفتن:** کولۆف کردن ف مُچالە‌کردن.

**کوڵۆك:** ١) کڵۆت؛ ٢) کڵۆك ف ١) استخوان کفل؛ ٢) دانۀ زودپز.

**کوڵووك:** کڵووك ف شکوفۀ درخت.

**کوڵـۆکـار:** ١) دیواربە سندە؛ ٢) بەنای دیواری بەسندە؛ ٣) بریتی لە مرۆی رێك‌و پێك‌و تەکوز ف ١) دیوار کلوخی؛ ٢) بنّای کلوخکار؛ ٣) کنایە از آدم مرتّب.

**کولوکۆ:** ١) قوڵت‌و کوڵ؛ ٢) خەم‌و خەفەت ف ١) جوش و غلیان؛ ٢) غم و اندوە.

**کولوکۆدامردن:** بریتی لە سووتان‌و لەناوچوون ف کنایە از بە کلّی سوختن.

**کوڵووکی:** لەز، پەلە ف شتاب.

**کوڵۆڵ:** کڵۆڵ، بەدبەخت ف بدبخت.

**کوڵۆم:** کڵۆم ف قفل چوبی در.

**کوڵۆمتە:** لای سەرووی دەرگا لەپشتەوە ف بالای در از داخل.

**کوڵۆم‌کردن:** کڵۆم لەدرگادان ف بستن در با قفل چوبی.

**کولومول:** شڕوشاتاڵ، کەل‌پەل، شتومەك ف خِرت و پِرت.

**کوڵۆنجە:** کوڵجە ف یلك آستین‌دار.

**کوڵۆندە:** ١) کڵجە؛ ٢) کوڵندە، جوانی کورتەباڵا ف ١) یلك آستین‌دار؛ ٢) زیبای کوتاەقد.

**کولوە:** ١) خانوچکەی زۆر پچووك؛ ٢) ئەلحەد، گۆڕێچە ف ١) کلبە؛ ٢) لحد.

**کۆڵـوەس:** زڕکـوڕێ کە ژن هێناویە دەگەڵ خۆیا ف ناپسری کە زن بە خانۀ شوهر می‌آورد.

**کولە:** کلۆ، کوللۆ، کوللە ف ملخ.

**کولهـ:** کۆخە، قۆزە، قفە ف سُرفە.

**کوڵە:** ١) قوڵە، کورت، کۆتا؛ ٢) بێ‌کلك؛ ٣) ژوژو؛ ٤) رەبەت، سیپە؛ ٥) کروشمــە بۆ گوێ‌گرتن لە خەڵــك ف ١) کوتــاە؛ ٢) بی‌دم؛ ٣) جوجەتیغی؛ ٤) کمین شکارچی؛ ٥) کزکردن برای استراق سمع.

**کۆلە:** عەبد، بەنی ف بردە.

**کۆڵـە:** ١) پەنجـەسەقەت؛ ٢) حەیوانی بێ‌شاخ؛ ٣) چکۆڵەی خڕ. بۆ شووتی دەڵێن: (شووتیە **کۆڵە**)؛ ٤) بێچوی چەند حەیوانێك؛ ٥) کۆڵو؛ ٦) لە کار ناشارەزا؛ ٧) وشەی چووك‌شاندان: (ئەوەند **کۆڵەی** دامێ)؛ ٨) پنـج و ڕەگ؛ ٩) قسـەی بێ‌تام؛ ١٠) خۆڵـەمێشی تەنـدوور؛ ١١) دەخڵێ کە درنــگ پێ‌دەگا؛ ١٢) منــاڵی باوك مردگ کە دایکی زوو شووئــەکـات‌و ئەیهێڵی؛ ١٣) لانی‌سەگ ف ١) ناقص انگشت؛ ٢) حیوان بی‌شاخ؛ ٣) کوچولوی گرد؛ ٤) بچۀ چند درندە و چرندە؛ ٥) نگا: کۆڵو؛ ٦) ناوارد؛ ٧) کلمۀ تصغیر؛ ٨) بیخ و بن گیاە؛ ٩) یاوە؛ ١٠) خاکستر تنور؛ ١١) کاشتۀ دیررس؛ ١٢) یتیمی کە مادرش شوهرکردە و او را بی‌سرپرست گذاشتە؛ ١٣) لانۀ سگ، سَگدانی.

**کولهایۆخ:** زۆربەکۆکە، کەسێ فرە بقۆزێ ف کسی کە زیاد سُرفە کند.

**کولەبا:** پەنەمانی زام ف آماس زخم.

**کوڵەبار:** دارێ کە بەر داری میوەی دەدەن ف چوبی کە تکیەگاە شاخۀ پرمیوە کنند.

**کۆڵەبار:** تێلەکە ف کولەبار.

**کوڵەباڵ:** فەرەنجی بێ‌قۆڵ‌و تا سەر پشتێند ف نیم‌تنۀ نمدی بی‌آستین.

**کوڵەباڵە:** کوڵەباڵ ف نگا: کوڵەباڵ.

**کوڵەبرك:** پلار بۆ میوەوەراندن ف چوبی کە بە درخت اندازند تا میوە بریزد.

**کوڵەبنە:** کنك، کورتەباڵا ف کوتاەقد.

**کۆڵەبەس:** زاڕوی ژن لە شوێکی تر، کۆڵوەس ف فرزند زن از شوهر سابق.

**کۆڵەبەست:** ١) کۆڵەبەس؛ ٢) رەپستە، ئاوەنیا ف ١) نگا: کۆڵەبەس؛ ٢)

نگا: ڕەپستە.
**کوڵەبی:** جۆرێ داربی ف نوعی بید.
**کوڵەپڕە:** کورتەباڵای قەڵەو ف کوتاەقد چاق.
**کوڵەپنج:** ڕەپستەی باشڕواوی خۆقایم کردو: (ڕەپستەمان **کوڵەپنج** بوە) ف کشت آبی پاییزۂ خوب روییده.
**کوڵەپێچ:** بەپەلە بەدەست گرتن: (**کوڵەپێچم** کردو هێنام) ف با شتاب گرفتن.
**کولـەت:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.
**کوڵەتی:** عەبدایەتی، بەندەیی ف بردگی.
**کوڵەجی:** کڵجە، کلۆجە ف نگا: کڵجە.
**کوڵەچوارشەمۆ:** قوڵەچوارشەمۆ ف چهارشنبەسوری.
**کولەحاجی:** کوللەحاجی ف آخوندك.
**کوڵەخانە:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.
**کوڵەخرتە:** کورتەباڵای ئەستوور ف کوتاەقد کُلُفت.
**کوڵەدار:** داردەستی کورت ف چو بدست کوتاە.
**کوڵەدار:** خاوەن بەنی ف بردەدار.
**کوڵەدار:** تێلەکەنیزنگ ف پشتۂ هیزم.
**کوڵەر:** ١) زەمین‌دەرەوە؛ ٢) توێژەر، توێژەرەوە ف ١) کاوشگر؛ ٢) پژوهشگر.
**کوڵـەرم:** ١) رمبی کورت، نێزە؛ ٢) بەرجیغ ف ١) نیزۂ کوتاە؛ ٢)چوب نگهدارندۂ چیغ چادر.
**کوڵەزرگ:** چینەدانی باڵندە ف چینەدان.
**کوڵەزوانە:** پوشو، قاو، پوشی ف هود، برهود.
**کولەژان:** کوانی زۆر بەئێش ف دُمل آزاردهنده.
**کوڵەس:** مێو رەی ڕەزی بەزەویدا راکشاو ف تاك بر زمین خوابیده.
**کوڵەسوچ:** قوژبن ف زاویۂ اتاق.
**کوڵەسە:** ١) ناوچەیەکەلەکوردستان؛ ٢) لانی سەگ ف ١) ناحیەای در کردستان؛ ٢) سگدانی.
**کوڵـەسی:** ١) کوڵکـەداری ئەستوور کە بۆ شڵخەمێش دەکوڵدرێ؛ ٢) قەدی ئەستووری دار ف ١) کندۂ ستبر که کندو کنند؛ ٢) تنۂ ستبر درخت.
**کوڵەش:** ١) کلۆش؛ ٢) بێ‌شەرمو حەیا ف ١) ساقۂ غلّە؛ ٢) پُررو، بی‌شرم.
**کوڵەفڕ:** هەوێردە، مەلێکە زۆرتر لەناو هەرزنجار هێلان دەکا ف پرندەای است.
**کولەك:** ١) تاقە لە دیواردا؛ ٢) جێ‌ڕسق لە چادردا؛ ٣) ڕۆچنە لە دیوار؛ ۴) تیخی تایبەتی کەوچك‌تاشین؛ ۵) شەل، پاسەقەت ف ١) طاقچە؛ ٢) جای آذوقه در چادر؛ ٣) روزنه در دیوار؛ ۴) کارد مخصوص قاشق چوبی تراشیدن؛ ۵) شل، لنگ.
**کوڵەك:** کلۆك ف دانۂ زودپز.

**کوڵەك:** قولنگە، زەنگن، پاچی دوسەر ف کُلنگ.
**کولـەکـان:** دوگوندی کوردستان بوون بەعسی وێرانی کردن ف نام دو روستای کردستان که توسط بعثیان ویران شدند.
**کوڵەکردن:** ١) کروشمەکردن لە سیپەدا؛ ٢) گوێ لە قسەی خەڵك گرتن لە پەناوە ف ١) نشستن در کمین؛ ٢) پنهان شدن برای استراق سمع.
**کوڵەکوڵ:** تەوژمی تین: (لە **کوڵەکوڵی** گەرمادا) ف شدّت و اوج.
**کوڵەکوێرو:** کۆرەمار ف نوعی مار سمّی.
**کوڵـەکـە:** ١) ئەستوون، ستوون، ئەستوند؛ ٢) لێك‌هاڵانی گەنمی بەقەوەت: (گەنمەکەم **کوڵەکەی** داوە) ف ١) ستون؛ ٢) بهم پیچیدن ساقەهای گندم سبز و شاداب.
**کوڵەکە:** کوندر، کدو، کودی، کولند، کولندەر ف کدو.
**کوڵەکەجەڕە:** داری دوحاچەی ڕاگری چەرخی ئاوهەڵکێشان ف ستون دوشاخۂ نگهدارندۂ چرخ چاه.
**کوڵەکەزێڕینە:** کوڵکەزێڕینە، کێرستوون، پەلکەزێڕینە ف رنگین کمان.
**کوڵەکەوا:** ئەستوونی بن کاریتە ف ستون زیر بالار.
**کوڵـەکێن:** ١) چێشتی کوڵـەکـە؛ ٢) بازی بە کدوی هێلکەیی ف ١) خوراك کدو؛ ٢) بازی با نوعی کدوی کوچك.
**کوڵەگە:** کوڵەکە، ستوون ف ستون.
**کوڵەمار:** کوڵەوەی‌باب، کوڵەوەی‌وا، مارێکی ژەهردارە ف نوعی مار.
**کولەماڵە:** ئامرازێکە لە نیر و ئامووردا ف ابزاری در خیش.
**کوڵەمانگ:** بریتی لە مانگی شابان ف کنایه از ماه شعبان.
**کوڵەمست:** مشتەکوڵە، مستەکوڵە ف مُشت گره شده.
**کوڵەمشت:** مشتەکوڵە ف مُشت گرەشده.
**کوڵەمەرگی:** ژیانی پڕ لە دەردی‌سەری ف زندگی پر مشقّت.
**کوڵەمەرگێ:** کوڵەمەرگی ف زندگی پرمشقت.
**کوڵەنانی:** کەسێ کە زاوای بەستراو دەکاتەوە ف کسی که می‌تواند داماد بسته را باز کند.
**کوڵەنجە:** کڵجە ف یلك آستین‌دار زنانه.
**کوڵەنجی:** کولاژدم، دوپشك ف عقرب.
**کولەند:** کوڵەکە ف کدو.
**کولەندەر:** کولەند ف کدو.
**کوڵەوار:** زۆر حاڵ‌خراپ ف بدحال.
**کوڵەوانە:** کوڵوانە، چارۆکە، چارەکە ف شانەپوش زنانه.
**کوڵەوەز:** زڕکوڕ بۆ ژن ف ناپسری نسبت به زن.
**کوڵـەوەژ:** دارێ کە خوڵی بن تەندووری پێ تێك‌وەردەدەن ف آتش کاو تنور، نیمسوز.
**کوڵـەوەس:** ١) ڕەپستە، ناوەنیا؛ ٢) کوڵبەست ف ١) نگا: ڕەپستە؛ ٢) نگا: کوڵبەست.
**کوڵەوەیباب:** مارێکی ژەهراوی‌یە ف ماری است سمّی.
**کوڵەوەی‌وا:** کوڵەوەیباب ف ماری است سمّی.
**کوڵەوەی‌واو:** کوڵەوەیباب ف ماری است سمّی.
**کوڵەوێژ:** چەنەوەری قسەبێتام ف تُرّهات‌گو، یاوەگو.

**کوله‌هـ:** ۱) کلاو؛ ۲) کوله، کولله [ف] ۱) کُلاه؛ ۲) مَلَخ.

**کوُلـه‌یی:** گوندێکی کوردستانه به‌عسی کاولی کرد [ف] نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**کوله‌یی‌ڤه‌وری:** ده‌نکه به‌فر که له ئاسمانه‌وه دێته خوار [ف] دانه‌های برف.

**کولی:** ۱) کلۆ، کولله؛ ۲) کاکـوڵ؛ ۳) چاوئێشـه؛ ۴) ژانی برین؛ ۵) نه‌تیژی؛ ۶) کلوی به‌فـر [ف] ۱) ملخ؛ ۲) کاکـل؛ ۳) چشم درد؛ ۴) دردزخم؛ ۵) کُندی؛ ۶) دانهٔ برف.

**کوڵی:** ۱) کورتی؛ ۲) جۆش‌هات [ف] ۱) کوتاهی؛ ۲) جوشید.

**کۆلی:** ۱) کۆلـه، به‌نی؛ ۲) ئێزنگ، پوُشکه‌و چرپی بۆسوته‌مه‌نی [ف] ۱) برده؛ ۲) هیزُم.

**کۆڵی:** ۱) بیابانی، چۆلپه‌رست؛ ۲) ناشی، له‌کارنه‌زان [ف] ۱) بیابانی؛ ۲) ناشی.

**کوُلی:** ۱) کۆڵ‌هه‌ڵگر، عه‌نباڵ، حه‌ماڵ؛ ۲) چۆڵپه‌ره‌ست [ف] ۱) حمّال؛ ۲) کولی.

**کولیا:** ئه‌شه‌لی [ف] می‌لنگید.

**کۆلیار:** که‌سێ که نوسراوان له‌سه‌ر به‌رد هه‌ڵ‌ئه‌که‌نێ [ف] حکّاك.

**کوڵیاگ:** کولاو [ف] ۱) جوشیده؛ ۲) پخته.

**کوڵیان:** ۱) کولان؛ ۲) جۆشان [ف] ۱) پخته‌شدن؛ ۲) جوشیدن.

**کولیانه‌وه:** کولانه‌وه [ف] به دردآمدن زخم تسکین یافته.

**کوڵیایی:** ۱) تیره‌یه‌کـه له کورد؛ ۲) مه‌ڵبـه‌نـدێکه له کوردستان [ف] ۱) تیره‌ای از کرد؛ ۲) ناحیه‌ای در کردستان.

**کوڵیت:** ۱) کۆخته؛ ۲) کولانه‌مریشك؛ ۳) داری کۆڵدراو بۆ میوه‌گوشین [ف] ۱) کوخ؛ ۲) لانهٔ ماکیان؛ ۳) کندهٔ مخصوص میوه‌فشردن.

**کوُلی‌تاك:** گوندێکی کوردستانه به‌عسی کاولی کرد [ف] نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**کوُلی‌تویکان:** گوندێکی کوردستانه به‌عسی کاولی کرد [ف] نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**کوڵیته:** کوڵیت [ف] نگا: کوڵیت.

**کولیجه:** ناوی دێ‌یه‌که له کوردستانی موکری [ف] نام دهی در کردستان.

**کولێجه:** کلّجه [ف] یلك آستین‌دار زنانه.

**کولیچ:** ۱) کلوی به‌فر؛ ۲) ناوی دێ‌یه‌که له کوردستان [ف] ۱) دانهٔ برف؛ ۲) نام دهی در کردستان.

**کولیچك:** که‌لوی په‌مۆ [ف] آغند.

**کولیچه:** کلوچه [ف] کلوچه.

**کۆڵی‌دار:** کۆله‌دار [ف] برده‌دار.

**کوڵی‌دڵ:** خه‌م‌و خه‌فه‌ت [ف] درد و غم.

**کوڵی‌ده‌رون:** هه‌ستی‌هه‌ناو، جۆشی‌ده‌رونی [ف] احساسات.

**کولێر:** کون له دیواردا، ده‌ربیجه [ف] سوراخ در دیوار.

**کولێره:** کوللێره، ستورك، ئه‌ستورك [ف] گرده‌نان.

**کولێره‌به‌چه‌ور:** کوللێره‌ی رۆن‌تێ‌هه‌ڵسواو [ف] گردهٔ روغن مالیده.

**کولێره‌چه‌وره:** کولێره‌به‌چه‌ور [ف] گردهٔ روغن مالیده.

**کولێره‌مه‌ژگه:** کولێره‌ی کاکڵه‌گوێز تێ‌کراو [ف] گردهٔ مخلوط با مغز گردو.

**کولی‌زه‌رك:** کوللۆی زه‌رد [ف] ملخ زرد.

**کۆلیسك:** ئامرازی که‌وچك‌کۆڵین [ف] ابزار ساختن قاشق.

**کولی کولی:** هه‌نگڵه‌شه‌له [ف] لَی‌لَی رفتن.

**کولیلێ‌به‌شك:** کوللۆیه‌کی زلی ئاماڵ‌سپیه [ف] نوعی ملخ درشت.

**کوڵی گری:** گریان به‌هێز، قوڵپی گریان [ف] گریهٔ شدید.

**کۆلیل:** خه‌مبار [ف] غمگین.

**کولیلك:** ۱) خونچه‌ی پشکوتوی گیاو گژ؛ ۲) شکۆفه‌ی دار [ف] ۱) گل صحرایی؛ ۲) شکوفهٔ درخت.

**کولیلکامل:** چۆڵه‌مه‌ی مل [ف] جناغ سینه.

**کولیلکانیسانێ:** ڕه‌به‌نۆك، گوڵه‌میلاقه [ف] آلاله.

**کولیلك‌دان:** گوڵ‌کردن. پشکوتنی گوڵی گیا [ف] شکوفه یا گُل درآوردن گیاه.

**کولی‌مه‌ك:** ئێسکی‌ران. له ئه‌ژنۆ به‌ره‌ژوُر تا سه‌ره‌تای زگ [ف] استخوان ران.

**کولی‌میری‌بچـوُك:** گوندێکه له کوردستان به‌عسی وێرانی کرد [ف] از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**کولی‌میری گه‌وره:** له‌و گوندانه‌ی کوردستانه که به‌عسی کاولیان کرد [ف] روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**کولین:** ۱) بوغـاری ناو ماڵ؛ ۲) کولێن، جێگـه‌ی رسق‌وئازوُخه [ف] ۱) اجاق درون دیوار، شومینه؛ ۲) جای آذوقه.

**کولێن:** ۱)جێگــه‌ی رسق له چادردا، کولــه‌ك؛ ۲) قوژبن: (کـه‌لێن‌و کولێن)؛ ۳) کولانه‌وه، وه‌ژان‌هاتنه‌وه‌ی زام [ف] ۱) جای آذوقه در چادر؛ ۲) گوشه، سوراخ سنبه؛ ۳) ریش شدن زخم.

**کوڵین:** وه‌جۆش‌هاتن [ف] جوشیدن.

**کوڵێن:** ده‌فری سواڵه‌ت تایبه‌تی شیر [ف] ظرف سفالین ویژهٔ شیر.

**کۆڵین:** ۱) زه‌وی‌دانه‌وه؛ ۲) ناو له دارو به‌رد ده‌رهێنان [ف] ۱) کندن زمین؛ ۲) حفر سنگ و چوب.

**کوڵێنـان:** گوندێکی کوردستانه به‌عسی کاولی کرد [ف] نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**کولیندك:** کوُله‌که، کدو [ف] کَدو.

**کولینْك:** کولاورۆژنه، کولانکه‌بان [ف] روزنهٔ بام.

**کوڵینگ:** زه‌نگن [ف] کلنگ زمین کندن.

**کۆلینْك:** ئامرازی دارکۆڵین [ف] ابزار حفر چوب.

**کولێنه:** ۱) کولانه‌مریشك؛ ۲) کولێن [ف] ۱) لانهٔ ماکیان؛ ۲) جای آذوقه در چادر.

**کۆڵینه‌وه:** ۱) توێژینه‌وه؛ ۲) له زه‌وی گه‌ڕان بۆ شتێ [ف] ۱) پژوهش؛ ۲) کاوش.

**کۆم:** ۱) پشت‌کوُڕ؛ ۲) قنگ؛ ۳) ئاڵقه‌ی دارینی درگاداخستن؛ ۴) کۆ، تۆپه‌ڵ، کۆگا [ف] ۱) کوژپشت؛ ۲) مقعد؛ ۳) کلون، قفل چوبی در؛ ۴) توده.

**کۆما:** تۆپەڵ، کۆگا، کۆ ف توده.
**کوُم:** ۱) کڵاو؛ ۲) وشەی پرسیار واتا: چۆنم؟؛ ۳) تفنگ؛ ۴) پۆپەی کەڵەباب؛ ۵) مەلێکی بچوکە ف ۱) کلاه؛ ۲) چطورم؟؛ ۳) مقعد؛ ۴) تاج خروس؛ ۵) پرنده‌ای است کوچك.
**کوماتەك:** ۱) بابۆڵەی ساواتێ‌پێچان؛ ۲) دەسرازەی لانك ف ۱) قُنداق بچّه؛ ۲) دست پیچ قُنداق.
**کۆماج:** ۱) ئەستوندەکی چادر؛ ۲) پشت‌بان؛ ۳) جۆرێ نان؛ ۴) بوغاری؛ ۵) تەوەرەی ئاسیاو ف ۱) ستون چادر؛ ۲) پشت بام؛ ۳) نوعی نان؛ ۴) بخاری دیواری؛ ۵) ابزاری در آسیاب.
**کۆماجە:** کۆترە، داری نێوان ستوُن‌و میچی خانو ف چوب رابط ستون و سقف.
**کوماخ:** لاقوُن ف باسن.
**کۆمار:** ۱) عەشرەت، خێڵ، عێڵ؛ ۲) حەشامات، ئاپۆرە ف ۱) عشیرت، ایل؛ ۲) جمعیّت مردم.
**کۆماری:** دام‌و دەستوُری ژیانی مەردم بە هەڵبژاردنی سەرکۆمار لە جیاتی پاڵشا ف رژیم جمهوری.
**کۆمانج:** ۱) ئەستوندەکی چادر؛ ۲) بانی پێڵەی ئاو رانەگر ف ۱) ستون خیمه؛ ۲) بام که آب در آن نماند.
**کۆماو:** چەماو، پشت کوُڕ ف خمیده‌پشت.
**کۆماوە:** کۆماو ف خمیده‌پشت.
**کومبر:** شوێنەواری تاشراو لە شاخ‌و ماهدا ف صخرهٔ تراشیده.
**کومبرەك:** ۱) دوندی چیا؛ ۲) سەرلق، چڵەپۆپە ف ۱) قُلّهٔ کوه؛ ۲) شاخهٔ انتهایی.
**کۆمبوُن:** ۱) کۆبوُن لە دەوری یەك؛ ۲) پشت‌چەمانەوە، کوُڕبوُن ف ۱) جمع شدن؛ ۲) پشت خمیدن.
**کۆمبوُنەوە:** کۆمبوُن ف نگا: کۆمبوُن.
**کومبە:** هەڵوایەکە لە ئاردو دمس‌و کونجی دەکرێ ف نوعی حلوا.
**کومبەت:** ۱) هەرەبەرز؛ ۲) گومەز ف ۱) بسیار مُرتَفع؛ ۲) گُنبد.
**کوم‌بەتاڵ:** برێتی لە بێوەژن، ژن‌بی ف کنایه از بیوه‌زن.
**کومبەلۆك:** کوارگ، قارچ، کارگ ف قارچ.
**کۆمبەها:** نرخی شت سەرجەم‌و بەتێکڕایی ف بهای عمده‌فروشی.
**کۆمبێژ:** ۱) گۆرانی‌وتنی بەکۆمەڵ؛ ۲) گەڕەلاوژە ف ۱) ترانهٔ دسته‌جمعی؛ ۲) نوبتی آوازخواندن.
**کۆمتان:** ناوی دێیەکە لە کوردستان کەبەعسی وێرانی کرد ف نام روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.
**کومتل:** کڵۆی چکۆڵە ف کلوخك.
**کوم‌تیژ:** کڵاوی قوُچ، تانج ف تاج.
**کۆم‌جا:** کام‌جێ؟، کوێنە؟ ف کجا؟.
**کومچا:** دوگمە، قوپچە، پشکوژ ف دُکمه.
**کۆمر:** زوخاڵ، خەڵوُز، رەژی، رەژو ف زغال.
**کۆمرە:** ئاپوُرەی مرۆ ف اجتماع مردم.
**کوُمڕەش:** ۱) برێتی لە عاجز، وەڕەز، جاڕز؛ ۲) برێتی لە ئێرانی؛ ۳) برێتی لە بەئێرەیی ف ۱) کنایه از ملول، پکر؛ ۲) کنایه از ایرانی؛ ۳) کنایه از حسود.
**کوُم‌زڕ:** کڵاوی بێ‌لێوارە ف کُلاه بی لبه.
**کوُم‌زرخ:** کڵاوی ئاسنین، خوُد ف کُلاه‌خوُد.
**کۆریفۆك:** کەریفۆك، شەمەترێلکە ف نگا: شەمەترێلکە.
**کومسا:** برینگاندنی باران، خۆش کردنەوەی باران ف بندآمدن باران.
**کومسۆر:** ۱) کڵاوسوُر، برێتی لە تورکی عوسمانی؛ ۲) برێتی لە قزڵباشی ئێران؛ ۳) برێتی لە عێلی بارزان ف ۱) کنایه از ترك عثمانی؛ ۲) کنایه از قزلباش ایرانی؛ ۳) کنایه از ایل کرد بارزانی.
**کومسە:** تاقەت، توان، تابشت ف یارا، توان.
**کومشین:** هەڵقرچان، قرمچین ف چروك شُدن.
**کۆم‌فرۆش:** بازرگانێ کە بەتێکڕایی شت دەفرۆشێ ف عمده‌فروش.
**کۆمك:** کۆمەڵە ئەستێرەی کۆ ف کهکشان.
**کوُمك:** ۱) کڵاو؛ ۲) پۆپەی کەڵەشێر ف ۱) کُلاه؛ ۲) تاج خروس.
**کۆمکاسێویان:** کۆمەڵە ئەستێرەی کۆ ف کهکشان.
**کومکومۆك:** خمەگرو، خمخمۆکە، قومقومۆك ف بُزمچه.
**کومکومین:** چەموُڵەدادانی سەگ‌و شێر و دڕندەی‌تر ف چنگال انداختن حیوان درّنده.
**کومکی‌شڤان:** گیایەکی دەشتی‌یە ف گیاهی است.
**کۆمگە:** عەمبار ف انبار.
**کۆمۆ:** پشت کوُڕ ف خمیده‌پشت.
**کۆمە:** ۱) کۆما، کۆ؛ ۲) سیپەی ڕاوکەر لە چیلکەو چاڵ ف ۱) توده؛ ۲) کمین شکارچی از ترکه و نی.
**کۆمەك:** یارمەتی، ناریکاری ف کمك.
**کۆمەکۆمە:** ڕۆیشتن بە پشتی چەماو ف خمیده رفتن.
**کۆمەکی:** کۆمەك ف کمك.
**کۆمەگ:** کۆمەك ف کمك.
**کۆمەگی:** کۆمەك ف کمك.
**کۆمەڵ:** ۱) کۆ، تۆپەڵ؛ ۲) پڕایی مەردم ف ۱) توده؛ ۲) تودهٔ مردم.
**کۆمەڵایەتی:** کارو باری لەمەڕ مەردمەوە ف اجتماعی، کار مردمی.
**کۆمەڵ‌بوُن:** لە دەوری یەك کۆوەبوُن ف دور هم جمع شدن.
**کۆمەڵتە:** کۆمەڵ ف توده.
**کۆمەڵگا:** شوێن‌و جێگەی پڕایی خەڵك ف مجتمع، محل اجتماع.
**کۆمەڵە:** پڕایی مردم ف تودهٔ مردم.
**کۆمەڵەبەستن:** کۆمەڵ‌بوُن ف دور هم جمع شدن.
**کومێ‌تللی:** سەری قامك، گوفك ف سرانگشت.
**کۆمی‌شەهیدان:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.
**کومین:** زیرە ف زیره.
**کون:** ۱) هەرشتێ لە ناوەڕاستی بڕوانرێ ڕوناکی ئەو دیوی لێ دیاربێ، قول؛ ۲) خانوی جانەوەرانی وردیلەو خزۆك‌و کێوی: (**کونەمێرو**، **کونەمار**، **کونەگورگ**، **کونەڕێوی**، **کونەورچ**)؛ ۳) کول، نەبڕ ف ۱)

سوراخ؛ ۲) لانهٔ حشرات و خزندگان و جانوران وحشی؛ ۳) کُند.

**کۆن:** ۱) رەشماڵ؛ ۲) پارچەی رەشماڵ؛ ۳) شتی زۆر دەکارهێنراو؛ ۴) قەدیمی و لەمێژینە ف ۱) سیاه چادر ییلاق نشینان؛ ۲) پارچهٔ سیاه چادر؛ ۳) کارکرده، کهنه؛ ۴) باستانی.

**کُون:** ۱) قن، قنگ، کن، کونگ، کنگ، قوُن؛ ۲) چلۆنن؟ ف ۱) مقعد؛ ۲) چطورند؟.

**کونا:** ۱) قول، کون؛ ۲) رۆچنە ف ۱) سوراخ؛ ۲) روزنه.

**کۆنا:** ۱) زرینگ، وریا؛ ۲) فێڵباز، فریودەر ف ۱) زرنگ؛ ۲) حیّال، مکّار.

**کونار:** دارێکە بەرێ دەگرێ لە بلچی زەرد دەکا ف درخت کنار.

**کونارشك:** ئانیشك ف آرنج.

**کوناموری:** شارەمێرو ف سورخ مورچه.

**کوناوچه:** رۆچنە ف روزنه.

**کوناوەدەر:** قول لە هەردوك دیوانەوە ف از دو طرف سوراخ شده.

**کوناوەجگە:** رۆچنەی سەربان ف روزنهٔ بام.

**کوناوەجه:** کوناوەجگە ف روزنهٔ بام.

**کوناوی:** کون کراو، سماو ف سوراخ شده.

**کونبڕ:** دادرانی هەمو بابوێر لە خانوُدا ف همهٔ سوراخهای خانه را اندودن.

**کون بوُن:** قول بوُن ف سوراخ شدن.

**کونبەتاڵ:** برێتی لە بێوەژن، کومبەتاڵ ف کنایه از بیوەزن.

**کونتار:** بناری چیا، داوێنی کێو ف دامنهٔ کوه.

**کۆنتۆ:** بەچکەچێلی دوبەهاردیتو، پارگوێل، پارگوێر ف گوسالهٔ یکساله، پارینه.

**کۆنتوله:** کۆنتۆ ف گوسالهٔ یکساله.

**کونــــج:** ۱) سوُج، قوژبــن؛ ۲) جنــجــیر؛ ۳) دەفــری سواڵـــەت بۆ گیاتێداچـانـدن؛ ۴) ئاولاوی، دەمو چاو خرو ێلکاوی ف ۱) کنج؛ ۲) خالدارسیاه و سفید؛ ۳) گلدان سفالین؛ ۴) آبلەرو.

**کونجاندن:** بەددان وردکردن، داکروژتن ف با دندان جویدن و خاییدن.

**کونجڕ:** ۱) زبری تیژ لە دەستلێدان؛ ۲) جنجیر ف ۱) زبر، خشن، ۲) حیوان خالدار.

**کونجرین:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**کونجڕك:** قورینج، قورنج ف نیشگون.

**کونجڕکه:** کونجڕك، قورنج ف نیشگون.

**کونجرە:** پێکوڵ، گیایەکی دڕکاویە ف خارسەکوهه، گیاهی است خاردار.

**کونجك:** ۱) بالاپۆشی دەروێشان؛ ۲) کونی وردیلەی پێست؛ ۳) کونج، گۆشە ف ۱) خرقهٔ درویشان؛ ۲) مسامات؛ ۳) کُنج، زاویه.

**کونجکاو:** تۆژەرەوە، کۆڵەرەوە ف کنجکاو.

**کونج کونجێن:** جۆرێ بازی ف نوعی بازی.

**کونجوڕ:** قوژبنی تەنگ ف گوشهٔ تنگ.

**کونجوڵ:** کونجوڕ ف گوشهٔ تنگ.

**کونجه:** کونجی ف کُنجد.

**کونجی:** دانەوێڵەیەکی زۆر وردی زەردە رۆنی لێ دەگرن ف کُنجد.

**کونجیت:** کونجی ف کنجد.

**کونجی کەرك:** کونجی خۆرسك، کونجیە کێویلە ف کُنجد کوهی.

**کونجین:** کونجاندن، داکروژین ف خاییدن.

**کونچك:** ۱) کونی وردیلەی پێست؛ ۲) سوُج، قولینج، ۳) کونی زۆر ورد ف ۱) مسامات؛ ۲) گوشه، زاویه؛ ۳) سوراخ بسیار ریز.

**کونـد:** ۱) کلك قوڵـه؛ ۲) بوُم، باڵنـدەیەکـە بە شەو دەردەکەوێ بە شوُم بەناوبانگە، بو ف ۱) دم کوتاه؛ ۲) جُغد.

**کوندر:** کدو، کوُلەکە، کودی، کودو ف کدو.

**کوندرێ:** ناوی ئاواییەکە لە کوردستان ف نام دهی است.

**کوندرێ میرانی:** کدوبارزانی، شاقەپاغی ف کدوحلوایی.

**کوندك:** ۱) کوندر؛ ۲) دەفری چەرم بۆ ئاوکێشان ف ۱) کدو؛ ۲) مشك آبکشی.

**کوندکێ ئاقی:** کوُلەکەسەراوی ف کدوتنبل.

**کوندکێ کوسه:** کدوی دۆڵمە ف کدوی دُلمه.

**کوندلفس:** باوەعەمرە، چلەنوك ف کوتوله.

**کۆندۆ:** چێڵێ کە ئاوس نەبوەو شیر دەدا ف گاوآبستن نشدهٔ شیرده.

**کونـدوش:** ۱) شتێکـە هێنـدێ پیاو لە جیاتی توتن کێشـان ئەیکـەنـە بێفلیانەوە؛ ۲) شوژن ف ۱) نوعی انفیه؛ ۲) جوالدوز.

**کونده:** دەفری زەلام لە چەرم بۆ ئاوکێشان، کوندك ف مشك آبکشی.

**کوندەبو:** بوُمی زل، کوندی زل ف بوف، جغد.

**کوندەبەبو:** کوندەبو ف بوف، جغد.

**کوندەز:** ئەسکوێ، ئوسکوُ، کەوچکی زل ف ملاقه.

**کوندەفسك:** کوندلفس، باوعەمرە، باواقوُرەت، چلەنوك ف کوتوله.

**کوندەلان:** ژێر زەمینی جێگەی کوندەناو لێ دانان ف سردابهٔ جای مشك آب.

**کوندی بۆر:** جۆرێ کوندی زەلام ف نوعی جُغد دُرُشت.

**کوندێ شەقێ:** کوندێکی رەنگاورەنگە ف نوعی جُغد رنگارنگ.

**کوندێ گۆڕا:** جۆرە کوندێکە لە زەلکاوان و گۆڕستان دەژی ف نوعی جغد.

**کون زوان:** تور، کەسێ کە قسەی بە رەوانی بۆ نایە ف الکن.

**کون زەین:** زەین کوێر ف کندذهن، دیرفهم.

**کۆنسال:** پیر و بەتەمەن ف سالخورده.

**کۆنك:** تۆکی باڵدار، پەڕوبۆ ف پَر پرنده.

**کونکاچاف:** گلێنەی چاو ف مردمك چشم.

**کون کردن:** ۱) قول کردن، کون تێ کردن؛ ۲) برێتی لە کج کردنەژن ف ۱) سوراخ کردن؛ ۲) کنایه ازبرداشتن بکارت.

**کۆنکریت:** خانوی بە ئاسن و چیمەنتۆ ف بتون آرمه.

**کۆنکوڵ:** دارێکی لێرەوارە بەرێکی وەك پەمۆ دەگرێ ف درختی است جنگلی.

**کۆنکی پیرێ:** جوُلاتەنەی جاڵجاڵۆکە ف تار عنکبوت.

**کونگ:** ١) قنگ، قوُن، کونی پاشەوە؛ ٢) کاکڵی دارگوێز کە بۆ ڕەنگ بەکـار دێت؛ ٣) بێهۆش؛ ۴) سڕ و تەزیو ف ١) مقعد؛ ٢) مغز درخت گردو؛ ٣) بیهوش؛ ۴) کِرخت.

**گۆنگ:** کاکڵەی دارگوێز، کَونگ ف مغزدرخت گردو.

**کۆنگرە:** ١) برجی سەر قەڵا، قونگرە؛ ٢) کۆبوُنەوەی ساڵانەی کۆمەڵ ف ١) برج قلعه؛ ٢) کُنگرهٔ حزبی.

**کونگە:** کوندە ف مشك آبکشی.

**کۆنگەرە:** کۆنگرە ف نگا: کۆنگرە.

**کونگی:** چارداخ، دیوارۆکـەی نەوی بۆ ماڵاتتیکردن ف حصار گلی برای دام.

**گونگیرە:** کۆنگرە، قونگرەی قەڵا ف دندانهٔ قصر و قلعه.

**کونمیز:** میزەچورتێ، گمێزەچۆرتکێ ف چکمیزك.

**کوننە:** کوندەی ئاو ف مشك آبکشی.

**کوننەزرانی:** کاسەی ئەژنۆ ف کاسهٔ زانو.

**کوننەڵان:** ١) کوندەڵان؛ ٢) تەپۆڵکە ف ١) نگا: کوندەڵان؛ ٢) تپه.

**کونۆ:** ١) سوُچ، قوژبن؛ ٢) برێتی لە ماڵی پچوُکی تەنیایی ف ١) کُنج، زاویه؛ ٢) کنایه از کُنج عُزلت.

**کونوڕ:** جەوی دارقەزوان ف انگم درخت بنه.

**کونۆش:** ١) کوندوش؛ ٢) ڕژدو ڕەزیل ف ١) نگا: کوندوش؛ ٢) خسیس.

**کونۆشە:** جاڕو، گەسك، گێزك ف جارو.

**کۆنـە:** ١) پەڕۆی دڕاو؛ ٢) لەمێژینـە، بەتـەمـەن؛ ٣) کوانـو، تفك؛ ۴) زرینگ، وریا؛ ۵) فێڵباز، فریودەر ف ١) وصلهٔ کهنه؛ ٢) قدیمی؛ ٣) اجاق؛ ۴) زرنگ، هوشیار؛ ۵) مکّار، حیّال.

**کوُنە:** ١) کوانو، ئاگردان، تفك؛ ٢) چلۆنن؟ ف ١) اجاق؛ ٢) چطورند؟.

**کونـەبـا:** ١) دەمەئەشکەوتێ کە بای بەتەوژمی لێوە دێت؛ ٢) برێتی لە درۆزنی بەشاتو شوُت ف ١) غاری که از آن باد می‌آید؛ ٢) کنایه از دروغگوی لاف‌زن.

**کۆنـەپـۆش:** ١) کەسێ کە جلکی کۆنی لەبەردایە؛ ٢) برێتی لە پیاوی تەرکەدنیای خواخواز ف ١) ژندەپوش؛ ٢) کنایه از مرد زاهد.

**کۆنەپۆشی:** ناوی عاشیرەتێکی کوردە ف نام عشیرتی در کردستان.

**کۆنەپەرست:** کەسێ کە بە تازەداهاتوان رازی نیە ف مرتجع.

**کۆنەپەرستی:** بیرو بڕوای کۆنەپەرست ف ارتجاع.

**کۆنـەسـوار:** ١) سوارچـاکی کارامـە؛ ٢) دومەکژەنی زۆرخانە ف ١) سوارکار ماهر؛ ٢) تنبك نواز زورخانه.

**کونەسە:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**کۆنـەسە:** گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**کونـەسیخـوڕە:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**کۆنـەفرۆش:** ١) کەسێ کە شتی قەدیمی دەفرۆشێ؛ ٢) سمسار ف ١) عتیقه‌فروش؛ ٢) سمسار.

**کونـەفلوُسـە:** لەو گونـدانـەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی درکردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**کونەقەل:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**کۆنەقەڵا:** ناوی گوندێکە ف نام دهی است.

**کونەکۆتر:** ١) ئەشکەوتێکی بەناوبانگە لە موکریان کەناوی تێدایە؛ ٢) لەو گونـدانـەی کوردستـانـە کە بەعسی کاولیان کرد ف ١) غاری معروف و پرآب در کردستان؛ ٢)روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**کونــەگـورگ:** گونـدێکـە لە کوردستـان بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**کونـەڵان:** ١) کونـدەڵان؛ ٢) ئابـدارخـانـەی دیوەخـان ف ١) نگـا: کوندەڵان؛ ٢) آبدارخانه.

**کونەڵە:** چەق، ناوەڕاست ف وسط.

**کونـەمار:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**کونەماسی:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**کونەماڵان:** ئەشکەوتێکی قوُڵو بەناوبانگە لە موکوریان لای کونەکۆتر ف غاری عمیق در کردستان.

**کۆنـەمـاوەران:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**کونەمشك:** ناوی دێیەکە لە کوردستان ف نام دهی است.

**کونی:** کون دە ئامرازی کانزادا ف سوراخ فلزی.

**کۆنی:** زۆر بەتەمەنی ف کهنگی.

**کوُنی:** ١) قوُندەر؛ ٢) چلۆن نیت؟: (کوی **کوُنی؟**) ف ١) کوُنی؛ ٢) چگونه‌نیستی؟.

**کونێر:** قوُنێر، دومەڵی لای قنگ ف دُمَلِ مجاور مقعد.

**کونێس:** پاڵ، دەڵەکدان ف هول دادن.

**کونێس کەردش:** پاڵی پێوەنا ف هول داد او را.

**کونیلە:** ١) کونی زۆرورد؛ ٢) کونی بنی مو لە لەشـدا ف ١) سوراخ بسیار ریز؛ ٢) سوراخ رویش مو در بدن.

**کۆنینە:** زۆر قەدیمی ف باستانی.

**کونیە:** سەرناو، نازناو ف لقب.

**کۆوە:** ١) بەران؛ ٢) بۆ کام جێ ف ١) راك؛ ٢) به‌کجا؟.

**کوهـ:** کول، نەتیژ ف کُند.

**کۆە:** کێو، چیا، کەژ ف کوه.

**کوُهـ:** پیرۆ، پێرو ف ستارهٔ ثریّا.

**کوهـ رزکا:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**کوهۆ:** کەوەرەنگ، شینی عاسمانی، ئاوی ف آبی لاجوردی.

**کوهۆن:** کۆن، کەون، قەدیمی ف قدیمی.

**کوێ:** کام جێ؟ ف کجا؟.

**کوێ:** ۱) کونی بیورو تەشوێ؛ ۲) چۆنی؟ ف ۱) سوراخ تبر و تیشه؛ ۲) چطوری؟.

**کویان گولـەجۆ:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**کُویایەن:** بەزەمیندا کەفتگ ف زمین خورده.

**کُویایەنە:** بەعەرزدا کەوتو ف زمین خورده.

**کوێت:** ۱) ئەسپی سوُری ئامـاڵەڕەش؛ ۲) کام جێگـەت؟ ف ۱) اسب سرخ مایل به سیاهی، کَهَر؛ ۲) کجایت؟.

**کُویت:** نەخۆشیقوۆڕی، گونپەنەمان ف فتق.

**کۆیتۆژکی:** چیایەکی زۆربەرزە لای دەرسیم لە کوردستانی بەردەستی ترکان ف کوهی بُلند در کردستان.

**کوێخا:** قوێخا، کۆخا ف کدخدا.

**کوێخاحمەدی:** جۆرێ ترێ ف نوعی انگور.

**کوێخایانە:** ۱) پێتاکی کوێخا؛ ۲) کاری پیاوانە ف ۱) باج کدخدا؛ ۲) کدخدامنشی.

**کوێر:** ۱) کوێر، کوێرە، بێچاو؛ ۲) پوُك: **(گوێزی کوێر)** ف ۱) کور؛ ۲) پوك.

**کُوێر:** قوُڵ ف ژرف.

**کوێرا:** چزوُ، چماوە بلەز ف چەزود.

**کوێرانە:** بە بێ دیتن کارکردن، وەك کوێر ف کورانە.

**کوێراو:** کانی کەمئاو ف چشمهٔ کم آب.

**کوێرایەتی:** کوێری ف کوری.

**کوێرایی:** ژیان بە کوێری ف کوری، نابینائی.

**کوێرایی داهاتن:** کوێرایی داهاتن ف نگا: کوێرایی داهاتن.

**کوێربوُن:** چاو لە دیتن بێبەش بوُن ف کورشدن.

**کوێربـوُنـەوە:** ۱) کوێرەوەبـوُن؛ ۲) ساڕێژبـوُنی برین ف ۱) نگـا: کوێرەوەبوُن؛ ۲) التیام زخم.

**کوێردڵ:** کەمفام، نائێگەیشتو ف کوردل.

**کوێرك:** ۱) کوێروُ، بەڵای ڕەشی گەنم؛ ۲) گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف ۱) سیاهـك گنـدم؛ ۲) نام روستـایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**کوێرکوێرانە:** کوێرانە ف کورکورانە.

**کوێرنان:** ڕژد، ڕەزیل، چکوس ف خسیس.

**کوێروُ:** کوێرك ف سیاهك گندم.

**کوێرە:** ۱) کابـرای کوێر؛ ۲) دەنکی بێکاکـڵ؛ ۳) لەئامانج‌نەدان؛ ۴) نەتـەقینی فیشەك ف ۱) فلان کور ؛ ۲) دانهٔ بی مغز؛ ۳) تیر به خطا رفتن؛ ۴) عمل نکردن فشنگ.

**کوێرەدەرە:** کوێرەدەرە ف نگا: کوێرەدەرە.

**کوێرەدێ:** کوێرەدێ ف کورەده.

**کوێرەڕێ:** کوێرەڕێ، ڕچە، بزنەڕێ ف کورەراه.

**کوێرەك:** ۱) کوێروی گەنم؛ ۲) کوێرەی دەنك ف ۱) سیاهك؛ ۲) دانهٔ بی‌مغز.

**کوێرە کـانی:** ۱) کانییەك کە هەر بەهـاران ئاوی هەیە؛ ۲) گونـدێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف ۱) چشمه‌ای که فقط در بهار آب دارد؛ ۲) نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**کوێرە کردن:** ۱) نەتەقینی فیشەك؛ ۲) لەئامانج‌نەدان ف ۱) منفجرنشدن فشنگ؛ ۲) به هدف نزدن.

**کوێرەمار:** کوێرەمار ف نوعی مار خاکستری رنگ.

**کوێرەموُشە:** چاوپروُش ف چشم کم سو.

**کوێرەوەبوُن:** کوێرەوەبوُن ف نگا: کوێرەوەبوُن.

**کوێرەوەری:** کوێرەوەری ف نگا: کوێرەوەری.

**کوێری:** کوێری ف کوری.

**کُوێری:** ۱) قوُڵی؛ ۲) لە دیتنی چاو حاسیە ف ۱) ژرفی؛ ۲) خارج از دید.

**کوێرێتی:** کوێرایەتی ف کوری.

**کوێریشك:** خەروێ ف خرگوش.

**کوێریەتی:** کوێرایەتی ف کوری.

**کُوێز:** کوُز، کوُزەلە ف ترتیزك آبی.

**کویزروك:** گیای گوُزروان ف گیاهی است.

**کویزەل:** چیایەکی زۆربـەرزە لە کوردستـانی بەردەستی ترکـان ف از کوههای بلند کردستان.

**کُوێژرك:** کاژێر، قوژبن، سوُچ، قولینچك ف گوشه، زاویه.

**کوێسان:** ۱) سەردەسێر، زۆزان؛ ۲) کوێسار ف ۱) سردسیر؛ ۲) کوهسار.

**کوێستان:** کوێسان ف نگا: کوێسان.

**کۆیسنجەق:** شارێکە لە کوردستان ف شهری در کردستان.

**کوێشتیر:** توێشتیر، چێشتیر، جوێشتیر ف بز دو ساله.

**کُوێشـك:** ۱) شەی پوُکـوتان، هەبە، کەرکیت؛ ۲) دەڵەك ف ۱) شانهٔ پودکوبی در بافندگی؛ ۲) نگا: دەڵەك.

**کوێشکە:** چوُلەکە، چوێلەکە، پاساری، چێشکە ف گنجشك.

**کویشـە:** لکی بن‌گڵ‌خراو بە بێ بڕین ف شاخهٔ زیر خاك خوابیدهٔ درخت.

**کوێك:** گونـدێکی کوردستـانـە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**کُوێك:** دارکوتکە ف دارکوب.

**کوێکان:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**کوێلە:** کوێلە، کوێلی، بەنی، بەندە، عەبد ف بردە.

**کوێلەتی:** کوێلەتی ف بردگی.

**کوێلەدار:** کوێلەدار ف بردەدار.

**کُوێن:** قوُن، قنگ ف مقعد.

**کوێن:** ۱) پارچەی ڕەشماڵ؛ ۲) کام جێ؟ ف ۱) پارچهٔ سیاه‌چادر؛ ۲) کجا؟.

**کویندەر:** کام جێ؟ ف کجا؟.

**کویندەرێ:** کام جێ؟ ف کجا؟.

**کویندەری:** خەڵکی کام جێی؟ ف کجایی هستی؟.

**کوینك:** کوینی چادر ف پارچهٔ سیاه چادر.

**کوینە:** کام جێ؟ ف کجا؟.

**کویۆ:** تاوێر، بەردی گلارەوبوگ ف سنگ غلتان از کوه.

**کۆیوسان:** ١) کۆساران؛ ٢) کوێستان ف ١) کوهساران؛ ٢) سردسیر.

**کویوە:** بۆ کام جێ؟ ف به‌کجا؟.

**کۆیی:** ١) کێوی؛ ٢) بریتی لە هیچ‌نەزان ف ١) کوهی؛ ٢) کنایه از وحشی.

**کە:** ١) ئەگەر؛ ٢) هەر دەمێ: (**کــە تۆ هاتی من دیم**)؛ ٣) پاشگــری دیاری‌کردن: (**کــوڕە کــە، ئەوە کە**)؛ ٤) دی، تر: (**ئەوی کە، پیاوێکی کە**) ف ١) اگر؛ ٢) هرگاه؛ ٣) پسوند علامت مَعرفه؛ ٤) دیگر.

**کهار:** ١) کاریلە؛ ٢) بزنی دوبەهار دیتوُ، کوُر ف ١) نوزادبُز؛ ٢) بُز دوساله.

**کهانەی:** کۆن، کۆنە، کەون ف کهنه.

**کەباب:** گۆشتی براژتی ف کباب.

**کەبابچی:** گۆشت‌برژێن ف کبابچی.

**کەبابخانە:** دوکانی کەباب‌فرۆشی ف کبابخانه.

**کەبابە:** ١) بەری داریکە بەقەی دەنکە ئیسوت بۆ دەرمان دەبێ؛ ٢) واروُك ف ١) کبابهٔ دارویی؛ ٢) جوجه‌مرغ رشید.

**کەبابەچینی:** کەبابەی دەرمان ف کبابه‌چینی.

**کەبــابی:** ١) بەڕەنگی کەبــاب. بۆ ترێ دەڵێن: (**تــرێ کەبــابی**)؛ ٢) گوشتێ کە دەیکەنە کەباب؛ ٣) کەباب‌فرۆشی ف ١) بەرنگ کباب؛ ٢) گوشت کبابی؛ ٣) کبابخانه.

**کەبات:** بەری داریکە لە جسنی نارنج شینی ئاماڵ‌زەردی قونجرقونجرە بۆ چێشت دەبێ ف نوعی نارنج.

**کەبادە:** داریکی بەزنجیرەوە کە لە زۆرخانەدا بەکاری دێنن ف کباده.

**کەبار:** ١) نۆبەرە؛ ٢) سەرەتای هەرشتێ؛ ٣) سەلای مەلا لە بەیاندا ف ١) نو بر؛ ٢) آغاز؛ ٣) مناجات سحری.

**کەبان:** کابان ف کدبانو.

**کەبانو:** کابان ف کدبانو.

**کەبانی:** کابان ف کدبانو.

**کەبانیتی:** کەیوانویی، ژنی زۆر بەماڵداری ف بسیار خانه‌داری، کدبانو بی.

**کەبر:** کەبەر، داریکی دڕکاویە. *بەرەکەی لە خەردەل دەکا* ف درختی است.

**کەبس:** ١) ژێرخــاك‌کردنی لکێ بۆ ڕەگداکــوتــان؛ ٢) ڕەنــج‌دان و شەکەت‌بوُن ف ١) نهال کاشتن؛ ٢) مَشقّت کشیدن.

**کەبلەمە:** دەرمانی هاڕدراو کە دەکرێتە دەمەوە ف داروی گردخوراکی.

**کەبۆت:** داریکی سەختی جەنگەڵیە ف درختی است جنگلی.

**کەبۆتەر:** کابۆك، کاقۆك، کۆتر ف کبوتر.

**کەبۆتەرڤان:** کۆتر باز ف کبوتر باز.

**کەبەر:** ١) دەوەنیکی دڕکاویە؛ ٢) مارچێوە ف ١) درختچه‌ایست خاردار؛ ٢) مارچوبه.

**کەبەروك:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**کەبــەنــد:** ١) پەتی درێژی سەربــەئاڵقە بۆ گرتنی حەیوانی ڕەوەك؛ ٢) پشتێن ف ١) کمند؛ ٢) کمر بند.

**کەبەندکێشان:** بازی تەناف‌کێشان ف بازی طناب‌کشی.

**کەپ:** ١) بێقل، دم؛ ٢) بەری دەست؛ ٣) پڕی یەك دەست؛ ٤) پوکاوڵە، چەمبــوڵە؛ ٥) فیز، دەعیە؛ ٦) بێ‌ددان؛ ٧) دوندو تروێکی چیا ف ١) بینی؛ ٢) کف دست؛ ٣) پر یك کف دست؛ ٤) ام‌کردن؛ ٥) تکبّر؛ ٦) بی‌دندان؛ ٧) قُلّهٔ کوه.

**کەپتار:** بناری چیای پڕلەدار ف دامنهٔ کوهٔ پُردرخت.

**کەپچە:** ئەسکوێ، کەفچی‌گەورە، کەوچێز ف ملاغه.

**کەپر:** خانوُچکەی لەشوُل و قامیش ف کپر، کازه.

**کەپروك:** ١) کەپری‌بچوُك؛ ٢) بریتی‌لەدنیا ف ١) کپر کوچك؛ ٢) کنایه از دنیا.

**کەپــروکــە:** ١) کەپــروك؛ ٢) دارەڕای کەپــر بــێ‌پرکــردنــە؛ ٣) توێژاڵکی‌شتی‌ترشــاو؛ ٤) پتــروکی‌سەربــرین ف ١) کپر کوچك؛ ٢) دار بست؛ ٣) کَفَك؛ ٤) خشك ریشه.

**کەپــروکــەبــەستن:** ١) توێژاڵکــەپەیدابوُن‌لەسەرترشــاو؛ ٢) پتروەبەستنی‌برین ف ١) کفك زدن؛ ٢) خشك ریشه بستن زخم.

**کەپــرە:** ١) پتــروکــەی سەربــرین؛ ٢) ریخی بەرپێ‌دراوی تونــدی وشك‌وڕەق؛ ٣) تەختایی‌سەرکێو ف ١) خشك ریشه؛ ٢) سرگین پامال شدهٔ سفت؛ ٣) زمین مسطح بالای کوه.

**کەپرەسەوزە:** جێژنێکی جوُلەکە ف از اعیاد یهود.

**کەپرەشینە:** کەپرەسەوزە ف نگا: کپره‌سوزه.

**کەپسوك:** سیخوڕ ف سیخول، تشی.

**کەپسوُل:** دەرمانی وردی دەبەرگ‌گیراو ف کپسول دارو.

**کەپسوُن:** چەشنی، تەرەقە ف ترقه.

**کەپك:** دەربەڕیوی جیانەبوُگەوە لە هەر شتێ ف دماغه.

**کەپکان:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**کەپکە:** کەپك ف دماغه.

**کەپلەمە:** ١) کەبلەمە؛ ٢) بریتی لە مشتە ف ١) نگا: کبلمه؛ ٢) کنایه از جَلق.

**کەپلەمــەکێش:** کەسێ کە بە دەست خۆ ڕەحــەت‌دەکــا، کەسێ کە دەسپەڕ دەکا ف جلق‌زن.

**کەپلەمەکێشان:** دەسپەڕکردن ف جلق‌زدن.

**کەپ‌لێ‌گرتن:** چەمبوڵەلێ‌نان، پوکاوڵەلێ‌نان ف ام کردن، پنجه‌گذاشتن.

**کەپن:** ١) بێ‌ددان، دەم‌بەتــاڵ؛ ٢) دەنگی ئاخافتنی بێ‌ددان ف ١) بی

دندان؛ ٢) صدای سخن گفتن آدم بی دندان.

**کەپۆ:** کەپ، کەپوُ، بێقل، دم ف بینی.

**کەپـوُ:** ١) قەحف، قاف، قاپێلکەسەر؛ ٢) بێقل، دم، کەپ؛ ٣) پوُکاوڵە، چەمبـوڵـە؛ ٤) ددانی پێشین؛ ٥) پیری بێددان ف ١) جمجمە؛ ٢) بینی؛ ٣) ام، پنجەگذاشتن؛ ٤) دندان پیشین؛ ٥) پیر بی‌دندان.

**کەپۆبەرانی:** پوُزبەران، قەپۆزبەران ف نگا: قەپۆزبەران.

**کەپۆرە:** ١) ئاپۆرە، حەشامات؛ ٢) دەنگەدەنگ‌وزەنازەنا ف ١) شلوغی جمعیت؛ ٢) همهمە و جنجال.

**کەپۆکەرە:** باڵندەیەکە وادەزانن کە دەخوێنێ دەڵێ کپوُ ف پرندەایست.

**کەپوُگە:** کەپۆ، لوُت، بیقل، دفن ف بینی.

**کەپۆل:** بێقل، کەپ، کەپۆ، دم ف بینی.

**کەپۆڵ:** ناوشان، قەلاندۆش، قوڵنج ف میان کتف، قلمدوش.

**کەپۆڵك:** ١) کەپۆ؛ ٢) کەپۆڵ ف ١) بینی؛ ٢) میانۀ کتف.

**کەپـوُلـە:** ١) قەپـوُلـە، قەپوُیلە؛ ٢) قاپێلکەسەر ف ١) پیمانۀ کوچك آسیابان؛ ٢) جمجمە.

**کەپوُن:** دمەلاسکە ف ادادرآوردن بە تمسخر.

**کەپـوُنی:** کەسێ کە دمـەلاسکـەی خەڵك دەکاتەوە ف کسی کە ادای دیگران را درمی‌آورد.

**کەپوُی:** کەپۆ، بێقل، دم ف بینی.

**کەپوُیلە:** کەپوُلەی ئاردپێوان، قەپوُلە ف پیمانۀ کوچك آسیابان.

**کەپە:** دەنگی ئاخافتنی بێددان ف صدای تکلّم آدم بی‌دندان.

**کەپەر:** ١) کلۆز، کولۆس، کەسێ کە ددانی پێشوی نیە؛ ٢) کەپر ف ١) کسی کە دندان پیشین ندارد؛ ٢) کپر، کازە.

**کەپـەز:** هەرچیایەك تەختایی لەسەرەوەی هەبێ ف کوهی کە بلندترین قسمت آن مسطح باشد.

**کەپەزە:** مرۆی رەزاگران‌و خوێنتاڵ ف آدم بدترکیب و گرانجان.

**کەپـەك:** ١) تێکـوڵی دانـەوێڵەی لەدەستـاڕکـراو؛ ٢) درشتەی ئاردی دابێژراو، کرپك ف ١) پوستۀ دانۀ آشی؛ ٢) نخالە.

**کەپەکەپ:** دەنگەدەنگی دەمی بێددان ف صدای دهان بی‌دندان.

**کەپـەلـەك:** کرمێکە بەگیاوە دەنیشێ پەز دەیخوا پێ دەمرێ، گیابڕ ف کرمی است کشندۀ گوسفندان.

**کەپەلەکی:** پەزێ کە گیابڕی خواردوە ف دام مبتلا بە سمّ «کەپەلەك».

**کەپەن:** ١) کفن، کەفەن؛ ٢) باڵاپۆش لە بەرگێی پەستاوتە، فەرەنجی ف ١) کفن؛ ٢) بالاپوش نمدی.

**کەپەنك:** فەرەنجی ف بالاپوش نمدی.

**کەپەنکە:** گەنم یا جوّ کە تازە دێ گوڵ بکا: (دە **کەپەنکە دایە**) ف گندم یا جو در شرف خوشەزدن.

**کەپـەنـە:** ١) فەرەنجی؛ ٢) کەبلەمـە ف ١) بالاپـوش نمدی؛ ٢) گرد داروی خوردنی.

**کەپـەنـەڕەش:** گونـدێکـە لە کوردستـان بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدۀ کردستان توسط بعثیان.

**کەپەنەك:** فەرەنجی: (لە نقوُشی غەزەلم چین‌و خەتا داماوە/کێ دەڵێ ئەمتیعەیی کوردە کەڵاش‌و **کەپەنەك**) «حاجی قادر» ف بالاپوش نمدی.

**کەپەنەکداڵ:** سیسارگ ف کرکس.

**کەپی:** بێقل، دم، کەپۆ، کەپ ف بینی.

**کەپی‌پان:** ١) بێقل‌فەتسی، کەپۆپان؛ ٢) جۆرێ هەنار ف ١) بینی پهن؛ ٢) نوعی انار.

**کەت:** ١) تەختی دارینی لەسـەرنـوستن؛ ٢) دەفـری قوُڵ‌و دمواڵا بۆ جێگـەی ئاردی نانـەوا؛ ٣) گیایەکی سێ‌پەڕەی بەپنجـە. خۆشترین *ئاڵفە بۆ حەیوانی گیاخۆر*، وێنجە؛ ٤) چاروُکە؛ ٥) لای سەروی قوُڵ؛ ٦) دەفری لێوارەشکاو؛ ٧) مرۆی لێوناتەواو؛ ٨) پارچە، پاژ؛ ٩) تاك، تەنیا؛ ١٠) بەزەمینـدابـەرەوەبو، کەوت؛ ١١) چاودێری؛ ١٢) زەلام؛ ١٣) بەسـەرهـاتی ناخـۆش؛ ١٤) باڵندەیەکی گۆشتخۆشە ف ١) تختخواب چوبین؛ ٢) ظرف آرد نانوا؛ ٣) یونجە؛ ٤) شانەپوش زنانە؛ ٥) قسمت بالایی بازو؛ ٦) ظرف لبەشکستە؛ ٧) آدم لب شکری؛ ٨) قطعـە؛ ٩) تك؛ ١٠) افتـاد؛ ١١) مراقبت؛ ١٢) گُنـدە؛ ١٣) رویداد ناگوار؛ ١٤) پرندەای حلال گوشت.

**کەتابنی:** بەرداشی ژێرو ف سنگ زیرین آسیا.

**کەتاسەری:** بەرداشی سەرەوە ف سنگ زبرین آسیا.

**کەتـان:** ١) گیایەکـە زۆر بەرز دەبێتـەوە پرزەی‌وەك دەزوی دەبێ؛ ٢) قوماشێکی سپی تەنکە، ٣) پسان، قەتان ف ١) گیاه کتان؛ ٢) پارچۀ کتانی؛ ٣) قطع شدن.

**کەتاندن:** پساندن، قەتاندن ف قطع کردن.

**کەتان‌کەتانە:** قامێکی گۆرانی‌یە ف آهنگی است.

**کەتـان‌وکەوان:** کوللە، قوماشی سپی دەوری تەختی نوستن لە ترسی پێشکە ف پشەبند.

**کەتانە:** ١) هەوای کەتان‌کەتانە؛ ٢) ناوە بۆ ژنان ف ١) آهنگی است؛ ٢) نام زنانە.

**کەتـانی:** ١) جلکی کەتـان؛ ٢) هەر قومـاشێکی ناسـك؛ ٣) بادامی کاغەزی ف ١) لباس از کتان؛ ٢) پارچۀ نازك؛ ٣) بادام کاغذی.

**کەت‌بەسە:** قوڵ‌بەستە ف کت بستە.

**کەترە:** ١) لەکارکەوتو؛ ٢) سست‌و گوێ‌نەدەر بە کار؛ ٣) عەیب‌و عار؛ ٤) فڕ ف ١) از کارافتادە؛ ٢) لاقید؛ ٣) عیب؛ ٤) هجو.

**کەترەخانە:** تەمەڵخانە، جێگەی بەخێوکردنی مرۆی لەکارکەوتو ف نوانخانە.

**کەترەخەم:** گوێ‌نەدەر، کارپشت‌گوێ‌خەر ف لاقید.

**کەتـرەیی:** ١) کاری کەتـرە، گوێ بەکـارنـەدان؛ ٢) قسەی بێ‌مانای بێ‌ئامانج ف ١) لاقیدی؛ ٢) سخن بیهودە، حرف بیخودی.

**کەتری:** کتری، کتلی ف کتری.

**کەتك:** ١) هەژیری ناومەشکەڕەقە؛ ٢) پشیلە، کتك، ختك ف ١) انجیر خشك در خیك؛ ٢) گُربە.

**کەت‌کەتە:** ١) یەکەیەکە؛ ٢) پارچەپارچە ف ١) یکی یکی؛ ٢) قطعەقطعە.

**کەتلە:** زەمبیلەی لە پوش ف زنبیل حصیری.

**کەتلی:** کەتری، کتری ف کتری.

**کەتن:** ١) بەزەمینـدا بەربـوونەوە؛ ٢) سوکایەتی؛ ٣) کاری خراپ؛ ۴) ئاژاوە؛ ۵) فریو؛ ۶) سواربـوونی نێر لە مێ، پەڕین؛ ٧) پەنـابـردن، وەدەغیل بوون ف ١) افتادن؛ ٢) اهانت؛ ٣) کار زشت؛ ۴) آشوب؛ ۵) فریب؛ ۶) پریدن نر بر مادە؛ ٧) پناەبردن.

**کەتن پێکـردن:** ١) فریودان؛ ٢) سوکایەتی بەسەرهێنان ف ١) فریب دادن؛ ٢) اهانت بە کسی کردن.

**کەتن کردن:** کاری زۆر خراپ کردن ف کار زشت کردن.

**کەتن گێڕ:** ئاژاوەچی ف فتنەانگیز.

**کەتن گێڕان:** ئاژاوەنانەوە ف آشوبگری.

**کەتن هەڤ:** پێکهەلپڕژان ف گلاویز شدن.

**کەتـو:** ١) کردو، بێڵێ کە بە دو کەس دەیکێشن لە تەختـەتەختەکردنی زەوی؛ ٢) تەختـەزەمین بۆ چاندن ف ١) بیل دونفرە کردسازی؛ ٢) کردکشاورزی، تختەزمین.

**کەتۆ:** ١) بێ‌هاوتا، تاقانە؛ ٢) ناوی پیاوانە ف ١) بی همتا؛ ٢) نام مردانە.

**کەتۆ:** ئەمتەرە، ئاوبارە، ئاوگەردان ف آبگردان.

**کەتوان:** چاوێر، چاوەدێر ف مراقب.

**کەتوانە:** چاوەدێری ف مراقبت.

**کەتوانی:** چاوەدێری کردن ف مراقبت، مواظبت.

**کەت وجوت:** تاك و جفت ف فرد و زوج.

**کەت وجوتانێ:** تاقمانەجوت ف بازی تك یا جفت.

**کەتوکلفت:** زەبەلاح، تەژە ف لندهور.

**کەتون:** کەبەند ف کمند.

**کەتوەر:** تەمەڵ و بێکارە ف شل و تنبل، بیکارە.

**کەتوەری:** تەمەڵی، بێکارەیی، خوێڕیەتی ف سستی، شلی، تنبلی، بیکارگی.

**کەتـە:** ١) لێوکـەت؛ ٢) دەفـری لاکەت؛ ٣) حەیوانی شاخ‌شکاو؛ ۴) زەبـەلاح؛ ۵) دەفـری ئاردی نانـەوا؛ ۶) قوبـڵی برنـج؛ ٧) بۆ جاری‌دووهـەم‌چنینـی پەلکی توتن ف ١) لب شکـری؛ ٢) ظرف لبەشکستە؛ ٣) حیوان شاخ شکستە؛ ۴) لندهور؛ ۵) ظرف آرد نانوا؛ ۶) دمپخت، کتە؛ ٧) چیدن دوبارە برگ توتون.

**کەتەپلاو:** قوبلی، قبولی ف دمپخت، کتە.

**کەتـەن:** ١) کەتـان؛ ٢) دەست بەستـراوی بێ دەسەلات ف ١) نگا: کەتان؛ ٢) دست بستە درماندە.

**کەتەو:** قفەی ولاخی بەرزا ف سرفۀ چهارپایان.

**کەتـی:** ١) پەڕاوی لێوارە؛ ٢) نێوانتێ کەوتـنی لێو؛ ٣) تاقـانـەیی، بێ‌وێنـەیی؛ ۴) بەزەمینا بەرەوەبوگ؛ ۵) لەکارکەوتو؛ ۶) نابوت‌بوگ؛ ٧) قەتێ، کوڕکـوڕ ف ١) شکستگی لبـە؛ ٢) لب شکری بودن؛ ٣) بی‌همتایی؛ ۴) افتادە؛ ۵) از کار افتادە؛ ۶) ورشکست شدە؛ ٧) مرغ سنگخوارە، باقرقرە.

**کەتێ:** ١) قەتێ، کوڕکـوڕ؛ ٢) ناوە بۆ ژنـان ف ١) مرغ سنگخـوارە، باقرقرە؛ ٢) نام زنانە.

**کەتیبە:** ١) سەردەرانەی بە خشتی سوور؛ ٢) نوسراوی زۆر قەدیم لە بەرد؛ ٣) دەستەیەك لە لەشکر ف ١) سردرآجری؛ ٢) کتیبە؛ ٣) گروهی از سپاه.

**کەتیر:** داری بن شەغرە کە دەکەوێتە سەر پشتی بارە بەر ف چوب زیر بار گیاە.

**کەتیرە:** شیرەی وشکەوەبوی گوێنی جەباری ف کتیرا.

**کەتیفە:** پاسارە، گوێ‌سوانە، سوانە ف لبۀ بام.

**کەتیکانێ:** قەمچان. گەمەیەکە بەپێنج بەرد دەکرێ ف بازی یەقُل دوقُل.

**کەج:** ١) خوار، چەوت، خێچ؛ ٢) دوت، کچ، قز، قیز ف ١) کج؛ ٢) دختر.

**کەجان:** ١) وشەی دواندنی کچ بە خۆشەویستی؛ ٢) ناوی ژنانە ف ١) خطاب دوستانە بە دختر، دخترجان؛ ٢) نام زنانە.

**کەجە:** بیانی، بێگانە، ناس‌نەکری ف ناشناس، بیگانە.

**کەجەر:** قەرەچ ف کولی.

**کەچ:** ١) چەفت، خوار؛ ٢) دوت، کچ؛ ٣) لێوکەت؛ ۴) لێوارەکەت ف ١) کج؛ ٢) دختر؛ ٣) لب شکری؛ ۴) لبەشکستە.

**کەچاچاڤ:** گلێنەی‌چاو، بیبیلەی‌چاو ف مردمُك چشم.

**کەچانی:** ١) کچانی؛ ٢) کچانە ف ١) پسر مقلّد دختران؛ ٢) شایستۀ دختران، دخترانە.

**کەچـایی:** ١) چەفتی؛ ٢) نارێکی: (ئەم قاڵیە **کەچایی** هەیە) ف ١) کجی؛ ٢) ناهمواری.

**کەچ حەلی:** زرکچ بۆ زرباب ف دخترخواندە.

**کەچ خولق:** ١) رووناخۆش؛ ٢) ناکارخراپ ف ١) اخمو؛ ٢) بداخلاق.

**کەچ خولك:** کەچ‌خولق ف نگا: کەچ‌خولق.

**کەچك:** داری بەکلکی سەرقوڵ‌کراو بۆ تراوراوگوێزتن ف قاشق.

**کەچکانی:** کەنیشکی، کچێنی، کونەکراوی کچ ف دختر باکرە.

**کەچکانی برن:** کچێنی نەهێشتن ف برداشتن بکارت.

**کەچکە:** یەکێ لە ئامرازی بەننایانە ف یکی از ابزار بنایی.

**کەچکـەقـولـە:** بەچکەبوقی هێشتا لە پێستی ساوایی دەرنەهاتگ ف کفچلیزك، نوزاد قورباغە.

**کەچو:** وشەی دواندنی دوت، ئەی کچ ف ای دختر.

**کەچولە:** ژارماسی ف گیاە زهر ماهی.

**کەچونە:** بەردی ئاگردان، کوچکاور ف سنگ اجاق.

**کەچە:** ١) تەحت، رایەخ لە بەرگنی پەستواو؛ ٢) فەرەنجی بێ‌قوڵ؛ ٣) پێشگـر بەواتـا: کۆنـەو بێ‌بایەخ: (**کـەچـەکـەوش**، **کەچـە بەرە**، **کەچـەکـلاو**، **کەچـەدەوری**)؛ ۴) حەیوانی شاخ‌شکـاو ف ١) نمد زیرانـداز؛ ٢) کپنك، بالاپوش نمدی بی‌آستین؛ ٣) پیشوند بە معنی فرسودە و بی‌ارزش؛ ۴) حیوان شاخ شکستە.

**کەچەترێن:** روشکاو، بەشەرماخراو: (جوابێکم دایەوە **کەچەترێنم** کرد) ف ازرو رفتە، شرمندەشدە.

**کەچەچی:** کەسێ کە بەرگن دەپەستێوێو دەیکاتە تەحتو فەرەنجی ف نمدمال.

**کەچەر:** ١) سەربرین؛ ٢) توُك لەسەرووەریو ف ١) کَل؛ ٢) سرطاس.

**کەچەری:** ١) نەخۆشی سەربرینداری؛ ٢) سەربێتوُکی ف ١) کَلی؛ ٢) طاسی.

**کەچەشاخ:** شاخدارێ کە شاخێکی شکابێ ف دام یك شاخ شکسته.

**کەچەڵ:** کەجەر ف نگا: کەجەر.

**کەچـــەڵان:** هۆزێکی کوردە لە کوردستـــانی بەردەستی ترکـان ف از طوایف بزرگ کُرد در ترکیه.

**کەچەڵۆك:** ١) چێشتێکە لە ساوارو نیسك چێ‌دەبێ؛ ٢) سیسارگە کەچەڵە ف ١) آشی است که از بلغور و عدس می‌سازند؛ ٢) کرکس.

**کەچەڵوگوڕی:** کەچەڵی تەواو کەچەڵو بەکرێژ ف کاملاً کَچَل.

**کەچەلە:** ئافرەتی کەچەڵ ف زن کچل.

**کەچـەڵـە:** جوچکەباڵندەیێ کە توُکەمردارەی وەراندوەو تازە توُکی لێ دێتەوە ف جوجهٔ کرك ریختهٔ تازه پر درآورده.

**کەچـەلـەك:** ١) کەمێك کەچـەڵ‌بوُگ؛ ٢) کوڕەکـەچـەڵەی قارەمانێ چیروکـان؛ ٣) باڵـدارێکی‌لاشـەخۆرە لەخەرتەل دەکا ف ١) اندکی کَچَل شده؛ ٢) پسرك کَچَل افسانه‌های کودکان؛ ٣) از انواع لاشخور.

**کەچەلەی:** کەچەڵی، توُشی نەخۆشی کەچەڵی هاتن ف کَچَلی.

**کەچەلی:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**کەچەڵی:** کەجەری ف نگا: کەجەری.

**کەچـەڵی‌خواشـوکور:** ئەوکەچەڵەی هەر تەوقەسەری کەچەڵەو موی لاجانگ‌و کاکۆڵی هەیە ف کسی که فقط وسط سرش کچل باشد.

**کەچـــەڵی گشتــــەکی:** ئەوکـــەسەی خەتێك موی‌ماوە لەبن کڵاوە دەری‌دەخا ف آن که فقط دورسرش مو دارد.

**کەچەڵی گەڕگەڕی:** کەچەڵوگوڕی ف کاملاً کچل.

**کەچی:** ١) خواری، چەوتی؛ ٢) دەگەل ئەوەشا: (من چاکەم کرد **کەچی** ئەو خراپـەی دەربـارە کردم)؛ ٣) مەبـەست چیە؟: (ئەم قسەت کرد **کەچی**؟)؛ ٤) خوارەوە بو، چەفتـــەو بو: (بـــە سەروُم وت کە ڕاست‌و سەرکـەش‌و بەرزی، **کەچی** لەرزی/کـە فەرقیشم بگـاتـە ئاسمـان بەندەی قەدی یارم) «نالی»؛ ٥) کەچك، قاشوخ؛ ٦) تۆ خواری ف ١) کجی؛ ٢) با اینهمـه، درنتیجه؛ ٣) منظور چیست؟، کەچی؟؛ ٤) کج شد، خم شد؛ ٥) قاشق؛ ٦) تو کج هستی.

**کەچـیچ:** ١) جێگـــە چینـــەکـــردنـی باڵـنـــدەی ماڵی؛ ٢) چینـــە، دان‌هەڵگرتنەوەی مەل ف ١) جای چینه‌کردن مرغ؛ ٢) چینه‌کردن مُرغ.

**کەچیلۆك:** کچۆڵە، کیژی بیچکەلانە ف دختر کوچولو.

**کەچین:** هێشتا هەر کچ ف هنوز باکره.

**کەچینی:** کچێنی، خوێنی نیشانەی کونەکراوی ف خون بکارت.

**کەحلان:** ئەسپی حدوُد ف اسب نجیب.

**کەحێل:** کەحلان ف اسب نجیب.

**کەخس:** کخس، خزکە، خسکە ف پیاز ریز کاشتنی.

**کەد:** ١) پارچەدارێك؛ ٢) بەهرەی زەمین؛ ٣) زەحمەت‌کێشان ف ١) یك تکه چوب؛ ٢) بهرهٔ زمین؛ ٣) رنج و زحمت.

**کەدوُ:** ١) کادێن؛ ٢) کدو ف ١) کاهدان؛ ٢) کدو.

**کەدون:** جەڕەی ئاو ف سبوی کوچك.

**کەدوُینك:** کەدون ف سبوی کوچك.

**کەدە:** ١) نەناسیاو، بێگانە، غەوارە؛ ٢) کوڕی چکۆڵە ف ١) ناشناس؛ ٢) پسربچه.

**کەدەر:** کەسەر، مەینەت، خەم ف غم، اندوه.

**کەدەو:** نەخۆشیەکی ماڵاتە کە لە سەرمان توُشی دێت ف از بیماریهای دامی.

**کەدی:** حەمایەت، رام، فێربوی ماڵ، کدی ف اهلی، رام شده.

**کەدینك:** ١) کەدون؛ ٢) کوُپەڵە ف ١) سبوی کوچك؛ ٢) خمچه.

**کەدێنە:** شەربەی سواڵەت ف لیوان سفالین.

**کەر:** ١) نیوەی جیا، لەت؛ ٢) پارچە، پاژ؛ ٣) پاشگری بەواتا: پێك‌هێنەر: (کـارکـەر)؛ ٤) کۆمـەڵی دابڕاو لە گەلە؛ ٥) قەر، قەرد، وام، واو؛ ٦) بارەبەری بە زەڕەزەڕ، گوێدرێژ؛ ٧) برێتی لە دەبەنگ‌و نەفام؛ ٨) شوی گامێش؛ ٩) جۆرێ حەیوانی چیا؛ ١٠) هیچ‌نەبیس، گوێ‌کپ؛ ١١) زەلام، قەبـــە: (کـەرمێش، **کەرمـۆز**)؛ ١٢) دیوی تەفی جگ؛ ١٣) چەمـاو، خوارەوەبـوُگ؛ ١٤) هەدا، ئۆقرە ف ١) شقه، نیمه؛ ٢) پاره، تکه؛ ٣) پسوند فاعلی، کننده؛ ٤) جمع جداشده از گله؛ ٥) وام؛ ٦) خر؛ ٧) کنـایه از نفهم؛ ٨) گاومیش نر؛ ٩) کل شکار؛ ١٠) ناشنوا؛ ١١) گنده، بزرگ؛ ١٢) یکی از جهات قاپ؛ ١٣) خمیده؛ ١٤) آرام و قرار.

**کەڕ:** ١) گوێ‌کپ؛ ٢) تیر، خەست ف ١) ناشنوا؛ ٢) غلیظ.

**کەرا:** ١) رشك؛ ٢) بەرد، کوچك، تەوەن ف ١) رشك؛ ٢) سنگ.

**کەڕا:** گاشەبەرد، تەلەسەنگ، بەردی زل ف سنگ بزرگ.

**کەراخ:** ١) قەراخ، رەخ؛ ٢) کەسێ کە بەسـەر بەشکـردنی ئاوڕادەگا، میراو ف ١) کنار؛ ٢) میراب.

**کەراس:** کراس، گجی، کرواس ف پیراهن.

**کەڕافی:** تینگی زۆر کە پیاو بخاتە گیانەڵاوە ف تشنگی کشنده.

**کەراقی:** کەڵك ف مرغ سقّا، پلیکان.

**کەراك:** هەوێردە، باڵنـدەیەکـە لە چێشکە گەورەترە ف پرنده‌ای است بزرگتر از گنجشك.

**کەراکە:** کەراك ف نگا: کەراك.

**کەڕاکی:** ساغ‌و پتـەو، دور لە نەخـۆشی واتـا: وەك گاشـەبەرد وایە ف صحیح و سالم.

**کەرامات:** کاری عاجباتی پیاوانی خوا: (کەشف‌و **کەراماتی هەیە**) ف کرامات اولیا.

**کەرامـەت:** ١) کەرامـات؛ ٢) بوُژانـەوەی گیاو گوڵ‌و شینکـە ف ١)

کرامات؛ ٢) دوباره جان گرفتن گُل و گیاه.

**کەڕان:** ١) کوتکی زلی بەردشکاندن؛ ٢) قرتان ف ١) پُتك بزرگ سنگ شکن؛ ٢) گُسستن.

**کەرانبابگاو:** جوێنێکە ف دشنامی است.

**کەرانبەر:** وشکەکەنگری بابردەڵە. قانگەلاشاك ف کنگر خُشك بادبُرده.

**کەرانـدش:** ١) ڕاکێشـان بە زەویدا؛ ٢) کێشـان بە تەرازو ف ١) دراز کشیدن؛ ٢) وزن کردن.

**کەڕاندن:** قرتاندن، کرتاندن ف گُسستن، پاره کردن.

**کەرانــە:** ١) پارەیێ کە پەشیمـــان لە سەودا بە فرۆشیاری ئەدا تا لێی وەرگرێتـــەوە؛ ٢) خاوە؛ ٣) باجـــێ کە بەرانبـــەر بە هەر بارە بەرێ دەستێنـدرێ؛ ۴) وەك کەر ف ١) پول پشیمـانی از معـامله؛ ٢) باج سبیل؛ ٣) باج سرانهٔ باربران؛ ۴) خرمانند.

**کەڕانـە:** ١) ئەنگـڕاو، دەوڵەمەن؛ ٢) لۆسە، مەلغە، باری، نویڵ ف ١) ثروتمند؛ ٢) اهرُم.

**کەراو:** بارە، فایدە ف بهره، فایده.

**کەراوی:** کەڵك، کەراڤی، مەلێکی ئاوی زلە ف مرغ سقّا، پلیکان.

**کەرایەتی:** کاری ئەحمەقانە ف روش احمقانه.

**کەرب:** ١) دەردو خەم؛ ٢) بێزو، مەگیرانی ف ١) غم و غصّه؛ ٢) ویار.

**کەربا:** بێزگ، مەگیرانی، بێزو ف ویار.

**کەرباف:** دژوێنێکە واتا: کوڕکەر ف فحش به معنی کُرّه خر.

**کەرباندن:** بێزوکردن ف ویارکردن.

**کەربایەی:** بێزگ، مەگیرانی ف ویار.

**کەربایی:** کەربایەی، بێزو ف ویار.

**کەربلێ:** گونـدێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**کەربۆکی:** هەمیشە دژو خەمبار ف همواره اندوهگین.

**کەربـوون:** ١) پێداگرتن لەسـەر کارو قسـەی بێ‌بایەخ؛ ٢) تۆڕەبوونی بێ‌ناقلانە ف ١) خرشدن؛ ٢) لجاجت کردن.

**کەڕبـــوون:** ١) کپ‌بوونـی گوێ؛ ٢) سوڕانی زۆر بەلـــەزی مزراح: (وا دەسوڕێ کەڕدەبێ) ف ١) کرشدن؛ ٢) چرخش با شتاب گردنا.

**کەربوونەکی:** هەمیشە دژو خەمبار بوون ف همواره اندوهگین بودن.

**کەر بەتین:** گازی بزمارکێشانەوە ف اَنبُر میخ بیرون کشیدن.

**کەربەش:** دڕکێکە کەر حەزی لێ‌دەکا ف خاربنی است.

**کەربـەلا:** ئەو جێگەی ئیمامحوسێنی لێ کوژرا، شارێکە لە عێراق ف کربلای حسینی.

**کەرپال:** شڕوشڕۆل، قەرپال، جلك‌قەتیای ف ژنده‌پوش.

**کەرپت:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**کەرپوچ:** خشت ف خشت.

**کەرپە:** بەربەندی‌ئاو، بەندی‌ئاو ف سدّ.

**کەرپەزە:** جۆرێ مارمیلکەی درێژە کە ڕەنگ‌دەگۆڕێ ف نوعی مارمولك.

**کەرپەسە:** خەمەگرۆ، قمقمۆکە، سەرمازەڵە ف چلپاسه.

**کەرپیچ:** کەرپوچ، خشت ف خشت.

**کەرت:** ١) دوپارچە؛ ٢) پارچە؛ ٣) بڕێ لە پەز؛ ۴) تیخی دەم‌لێ‌بەڕیو؛ ٥) چارەگ، لەچوارپاژ پاژێك ف ١) دونیم؛ ٢) پاره، قطعه؛ ٣) قسمتی از گله؛ ۴) تیغ لب پریده؛ ٥) یك چهارم، چارك.

**کەرتال:** گیایەکی بەدڕکەو لە کەنگر دەکا ف گیاهی است شبیه کنگر.

**کەرتڕ:** چەنەبازی قسەبێ‌تام ف وراج.

**کەرتـــڕێنــــە:** ١) بریێتـی لە سەربـــەرەوژوورەی زۆر ڕژد؛ ٢) بریێتـی لە دوامین‌کایەی جۆراوبازی ف ١) کنایه از سر بالایی سخت؛ ٢) کنایه از آخرین دور جوراب بازی.

**کەرتك:** کەرت ف نگا: کەرت.

**کەرتکین:** پەڕینی لێوارەی تیخ ف لب پرشدن تیغ.

**کەرتل:** کەرت، کەرتك ف نگا: کەرت.

**کەرتلاندن:** پارچەپارچەکردن ف قطعه‌قطعه‌کردن.

**کەرتو:** کردو، ورچ و لۆتی ف گرازکشاورزی.

**کەرتۆپە:** کەرتۆڵ، سێفەزەمینە، پەتاتە ف سیب‌زمینی.

**کەرتۆل:** پەتاتە، سێفەزەمینە، کەرتۆپە ف سیب‌زمینی.

**کەرتە:** دەستەبەزێك پێکەوە، کەرتکەمەڕ ف گلهٔ کم عدد.

**کەرتەڕ:** بەری گیایەکە لە خەیار دەچێ‌و زۆر تاڵە ف نوعی خیارکوهی تلخ.

**کەرتەشی:** گیایەکی بەدڕکی سەرخڕە ف گیاهی است خاردار و سرگرد.

**کەرتەك:** ١) پارچەیەك؛ ٢) زۆر، گەلێك ف ١) یك قطعه؛ ٢) بسیاری.

**کەرتەل:** بەشێکی زۆر لە هەرشتێ ف قسمت اَعظم از هرچیز.

**کەرتەلەڕ:** یەکسمی کزو بێ‌هێز ف ستور لاغر مردنی.

**کەرتەول:** گیایەکی بەرزە بالآیە لە گۆگەم ئەکا ف گیاهی است.

**کەرتێنە:** داوی جاڵ‌جاڵۆکە ف تار عنکبوت.

**کەرجـە:** کەنــە، جانــەوەرێکە بەمالاتەوە دەنوسێ‌و بۆرە ف از حشرات دامی، کنه.

**کەرچل:** تێکەلاو، تێکدراو ف بهم‌زده، آمیخته.

**کەرچلان:** کەرچل ف نگا: کەرچل.

**کەرچلاندن:** تێکەڵدان، تێکدان، لێکدان ف بهم‌زدن، بهم آمیختن.

**کەرچلی:** تێکدراو، تێکەلاوکراو ف بهم زده، آمیخته.

**کەرچلین:** کەرچلان ف بهم زده، آمیخته.

**کەرچوقە:** شەڕانی، نەگونجاو ف ستیزه‌جو، ناهنجار.

**کەرچەك:** پێلاوی خوارو خێچ‌و دڕاو ف کفش زواردررفته.

**کەرچیچەك:** جۆرێ داری جەنگەڵیە ف از درختان جنگلی.

**کەرخ:** ١) دەنــگ‌نوســـان، دەنـگ‌کەتن؛ ٢) سنــوور، کەوشـەن؛ ٣) جێ‌دروێنەی پاڵە لە ڕۆژێکدا؛ ۴) دەفری سواڵەتی قەوزەلێ‌نیشتو؛ ٥) تەزیو، سڕ؛ ٦) شوێن، شوێ؛ ٧) لەبەرچاوکەوتن، بێزاری؛ ٨) نالی، لا ف ١) صداگرفتگی؛ ٢) مرز؛ ٣) درویدهٔ یك دروگر در روز؛ ۴) ظرف سفـالین کهنهٔ خزه‌گرفته؛ ٥) سر، کرخ؛ ٦) رد، اثر؛ ٧) بیزاری؛ ٨)

طرف، نزد.

**کەرخانە:** ۱) کانی بەرد لێ هەڵکەندن؛ ۲) چاڵەبەفر؛ ۳) جوننەخانە [ف] ۱) معدن سنگ؛ ۲) برف انبار؛ ۳) فاحشەخانە.

**کەرخانەچی:** دەویت، گەواد، قورمساخ [ف] دَیّوس.

**کەرخ بوُن:** ۱) تەزین، سڕ بـــوُن؛ ۲) دەنـــگ کەتن؛ ۳) جاڕزبـــوُن، بێزاربوُن [ف] ۱) کرخیدن، کرخ شدن؛ ۲) صداگرفتن؛ ۳) بیزارشدن.

**کەرخنکێنە:** گیایەکە [ف] گیاهی است.

**کەرخو:** قەرغو، جۆرەقامیشێکە بلوری لێ چێ دەکەن [ف] نوعی نی کلفت.

**کەرخۆر:** چڵەك، نەوسن، چڵێس [ف] شکمو.

**کەرخول:** شێلاقە، جۆرێ مزرەقی بێ‌تمتمەیە بەقامچی‌لێدان دەسوُڕێ [ف] گردنای بی نوك آهن کە با تازیانەزدن می‌چرخد.

**کەرخەپ:** رزیو لەبەر کۆنی [ف] پوسیدە از کهنگی.

**کەرخەس:** کاری هیچ‌و پوُچ‌و بێ‌فایدە: (ئەوەی تۆ ئەی‌کەی **کەرخەسە** کار نیە) [ف] کار بیهودە.

**کەرخەسپال:** لەکارکەوتە، بکێرنەهاتی [ف] از کارافتادە.

**کەرخـەسێن:** برێتی لە کەسێ کە کاری هیچ‌و پوُچ دەکـا [ف] کنایە از کسی کە کارهای بیهودە می‌کند.

**کەرخەك:** بەسەریەکدا کۆماکراو [ف] برهم انبارشدە.

**کەرخین:** کەرخ بوُن [ف] نگا: کەرخ بوُن.

**کەرد:** ۱) تەختەزەوی بۆ چاندن؛ ۲) کاری ڕابردوی کردن، کردی [ف] ۱) کردکشاورزی؛ ۲) انجام داد.

**کەردار:** چاروێدار، خەربەندە [ف] چاروادار.

**کەردڕ:** کەرخنکێنە [ف] گیاهی است.

**کەردز:** ۱) سیرمـــەخـــۆر، دزی خوێڕیلە: (تـــۆ شێخی حیلەســازی قومارباز‌ی **کەردزی**) «مەسوِل»؛ ۲) گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد [ف] ۱) دَلـەدزد؛ ۲) از روستـاهـای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**کەردو:** ۱) کەرد، تەختەزەوی؛ ۲) کردوی دێراوهەڵدان؛ ۳) گیای کاردو [ف] ۱) کردکشاورزی؛ ۲) گراز کشاورزی؛ ۳) گیاه «کاردو».

**کەردوکێش:** کردوکێش [ف] کسی کە گراز کشاورزی می‌کشد.

**کەردە:** کردە، کردن‌بەهەموماناکانیەوە [ف] کردن.

**کەڕە:** زەوینی پڕلەبەرد، بەردەڵان [ف] زمین سنگلاخ.

**کەرزك:** ۱) گەنـە، کەرجە؛ ۲) برێتی لەمرۆی‌زۆردرۆزن [ف] ۱) کَنِه؛ ۲) کنایە از آدم بسیار دروغگو.

**کەرزوُر:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد [ف] روستایی درکردستان کە بعثیان آن را ویران کردند.

**کەرزین:** ۱) قەرسین، لەسـەرمان‌نارەحەت‌بوُن؛ ۲) بەستەڵەك [ف] ۱) لرزیدن از سرما؛ ۲) یخبندان.

**کەرژال:** کاری زۆرگران [ف] کار بسیار دشوار.

**کەرژنگ:** قرژانگ، قرژاڵ [ف] خرچنگ.

**کەرژە:** کەرجە، گەنە [ف] کَنە.

**کەرساقا:** گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد [ف] از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**کەرستـــە:** ۱) ئەسپـابـاتێ کە شتێکی لێ دروست بێ؛ ۲) ئامـرازی شت‌دروست‌کردن [ف] ۱) موادّ اوّلیّە؛ ۲) ابزار.

**کەرسل:** تەرسەقول، قەرسەقول [ف] مدفوع الاغ.

**کەرسمە:** رەگێکە لە کەپوّی کەردا دەیبڕن [ف] رگی در بینی الاغ کە آن را قطع می‌کنند.

**کەرسوّنە:** تەپاڵەکێویلە [ف] تاپالهٔ دشتی.

**کەرسە:** کەرستە [ف] نگا: کەرستە.

**کەرسەپ:** سەوزیەکە دەچێندرێ، کەرەوز [ف] کرفس.

**کەرسەڕ:** ۱) مزراح؛ ۲) جۆرێ مراوی [ف] ۱) گردنا؛ ۲) نوعی مرغابی.

**کەرســەڕە:** ۱) جۆرێ مراوی؛ ۲) قوّڕقوّڕە، مزراحی ناوکوّڵدراو [ف] ۱) نوعی مرغابی؛ ۲) گردنای توخالی شدە.

**کەرسەك:** سندە، کلۆخاکی زل [ف] کلوخ بزرگ.

**کەرسەگ:** ۱) کەرسەك؛ ۲) برێتی لە بەدیمەن‌گێلی بەدڵ لەسەرهۆش [ف] ۱) کلوخ بزرگ؛ ۲) کنایە از بە ظاهرکودن تودار.

**کەرسین:** وشك‌بوُنەوە، مەیین [ف] خُشك شُدن.

**کەرش:** کرش، عوُر [ف] شکمبە.

**کەرشین:** ۱) زگ‌زل؛ ۲) برێتی لە سەیدی بەدرۆ [ف] ۱) شکم گندە؛ ۲) کنایە از سیّد دروغین.

**کەرفتن:** بیزهەستان لە خواردنێك [ف] دل بە هم آمدن از خوراکی.

**کەرك:** ۱) لەت، پارچـە؛ ۲) کەرتەپەز؛ ۳) عابای بێ‌قوّڵ [ف] ۱) قطعە، پارە؛ ۲) قسمتی از گلە؛ ۳) عبای بی‌آستین.

**کەڕك:** ۱) خرچـــە، قەرەخـــرچـــە؛ ۲) کۆتـــەڵـــی کەر لەدار بۆ بازبـەسەرداهاویشتن؛ ۳) هەنجیری کاڵ؛ ۴) برینگ [ف] ۱) خربزهٔ کال؛ ۲) خَرَك؛ ۳) انجیر کال؛ ۴) دوکارد.

**کەرکردن:** ۱) لەت‌کردن؛ ۲) فریودان، خەڵەتاندن [ف] ۱) پارەکردن؛ ۲) فریب دادن.

**کەڕکـردن:** ۱) گوێ‌کپ‌کردن؛ ۲) خەست کردنەوەی تراو: (بەفراوی **کەڕبگرەوە**)؛ ۳) داکوتانی گیزگیزە جـۆرێ کە دەنگی ببـڕێ [ف] ۱) ناشنوا کردن؛ ۲) غلیظ کردن آبکی؛ ۳) چرخاندن سریع گردنای توخالی طوری کە صدای آن بخوابد.

**کەرکـــرن:** ۱) کەرکـــردن؛ ۲) قەرزکـــردن، وام‌وەرگرتن [ف] ۱) نگـا: کەرکردن؛ ۲) وام گرفتن.

**کەرکنج:** قرژانگ، قرژال [ف] خرچنگ.

**کەرکۆت:** گۆگرد کانزایەکی زەردە و زوُ ئاگر دەبا [ف] عُنصر گوگرد.

**کەرکوُتی:** شێوێکە لە گەنمەکوتاو دروُست دەبێ [ف] آشی است.

**کەرکوژ:** زاڵە، روُل، روُلك [ف] خرزهرە.

**کەرکوژە:** کەرخنکێنە، کەردڕ [ف] گیاهی است.

**کەرکـوُش:** جۆرێ ترێی نەبـاش: (ئـەز قوربانۆ پەشوشۆ/رەزك دانی ژکـەرکـوشۆ/تولێ نەبو بدەموُشۆ) «شێعریکی نەناسراو» [ف] نوعی انگور نامرغوب.

**کەرکوڤی:** کەرەکێوی، گوّرەکەر ف گورخر.
**کەرکوك:** شارێکە لە کوردستان ف شهری درکردستان.
**کەرکوڵ:** ۱) جاش، جاشك، دەحشك؛ ۲) گیایەکی سەرخڕی بەدڕکە؛ ۳) گیایەکـە لە تیرەی کەمـاو هەڵـز ف ۱) کُرەخر؛ ۲) گیاهی است خاردار؛ ۳) گیاهی است از تیرهٔ انجدان.
**کەرکوڵ وبارسوك:** برێتی لە فەقیری ناسوُدە ف کنایە از ندار آسودەدل.
**کەرکە:** جزیرەئاسایی ف شبەجزیرە.
**کەرکەریك:** کرکروّکە ف غضروف.
**کەرکی:** کەرەکی، کەرانە ف ابلهانە.
**کەڕکی:** مێوینەی کەڵەشێر، مامر، مریشك ف مرغ خانگی، ماکیان.
**کەرکیت:** شەی پوّکوت، هەپە ف دفتە، شانهٔ پودکوبی.
**کەرکێ فاتمێ:** ناڕیلوّکە ف آخوندك.
**کەرگ:** کەڕکی، مامر ف مرغ خانگی.
**کەڕگاسیای:** مریشکی ڕەش کە دەڵێن ودمی باش نیە ف مُرغ خانگی سیاه کە گویند شوم است.
**کەرگاکوّرە:** برێتی لە کەموُسکە، زوّر کەم ف کنایە از بسیار اندك.
**کەڕگامیسری:** بەقلەموُت، عەلەشیش، بوّقلە، قەلەموُنە ف بوقلمون.
**کەرگان:** ۱) دەفری ترێ تێداگوشین؛ ۲) گوشکە بوّدوشاوکردن ف ۱) ظرف جای آبگیری انگور؛ ۲) عصّاری.
**کەرگراڤ:** زەوینێ سێ لای ئاو بێ و لایەکی وشکانی ف شبەجزیرە.
**کەرگوێ:** خەروێ، کەروێشك ف خرگوش.
**کەرگوێـ:** کەروێشك ف خرگوش.
**کەرگە:** ۱) دەسك؛ ۲) گوشینگەی هەنگوُر؛ ۳) مامر ف ۱) دستە؛ ۲) عصّاری؛ ۳) مُرغ خانگی.
**کەرگەداس:** دەسکەداس، کلکەداس ف دستهٔ داس.
**کەرگـەدەن:** جانەوەرێکی زوّر زلە شاخی لەسەر کەپوّی هەیە پێستیان دەکردە سپەر بوّ شەڕەشیر ف کرگدن.
**کەرگەدەنگ:** کەرگەدەن ف کرگدن.
**کەرگەز:** سیسارگ، سیسارگەکەچەڵە ف کرکس.
**کەرگەلارێ:** باڵداریکە ف پرندەایست.
**کەرگی:** کەرکی، مامر ف مرغ خانگی.
**کەرگێ:** کەسێ کە ئیلاقەی کەر دەکا ف کسی کە با خر جماع کند.
**کەرلـەوەڕێن:** ۱) شوانـی کەران؛ ۲) برێتـی لە کەسێ کاری سوُك و بێبایی دەکا ف ۱) الاغ‌چران؛ ۲) کنایە از کسی کە کار بی‌ارزش کند.
**کەرم:** کرم، کورم ف کِرم.
**کەرمات:** ۱) زوّرزیاد، زەحف؛ ۲) بوژانەوەی شینایی، گەشەکردن؛ ۳) وشیارکردنەوەی مەردم ف ۱) بسیار زیاد؛ ۲) دوبارە جان گرفتن گُل و گیاه؛ ۳) بیدارکردن ملّت.
**کەرمخ:** گیایەکی گەڵادەرزییە ف گیاهی برگ سوزنی است.
**کەرمجین:** کرمێ بوُن ف کرمو.

**کەرمجینی:** ۱) کرمەرێزی؛ ۲) برێتی لە زوّرچەپەڵی و گەماری ف ۱) کرم ریختن؛ ۲) کنایە از آلودگی بسیار.
**کەرمژین:** کەرمجین ف کرمو.
**کەرمشین:** قرمچین ف نگا: قرمچین.
**کەرمك:** کرمێ، کرم‌لێ‌دراو ف کرمو.
**کەرمنـدار:** ۱) بەخشینی خاوەن دەسـەلاّت؛ ۲) ناوی گونـدێکـە لە کوردستان ف ۱) بخشش صاحب قدرت؛ ۲) نام روستایی در کردستان.
**کەرموتان:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان کە توسط بعثیان ویران شد.
**کەرموّز:** مێشێکی چزوداری درشتە بە ماڵاتەوە دەدا، شینەموّزە ف نوعی مگس درشت نیشدار.
**کەرمـە:** ریخی بەرپێ دراوی ڕەق‌هەڵاتـگ، کەمرە، کەپرە ف سرگین پامال شدهٔ خشك و سفت.
**کەرمەژین:** کرمژین ف نگا: قرمچین.
**کەرمەلیس:** مێخوّش، ترش‌وشیرین ف تُرش و شیرین.
**کەرمێش:** ۱) مێشی درشت؛ ۲) نێری مێشەنگوین ف ۱) خرمگس؛ ۲) زنبورعسل نر.
**کەرنگ:** قورینگ، باڵداریکە ف پرندەای است.
**کەرو:** ۱) کول، نەتیژ، نەبـڕ؛ ۲) بکـا؛ ۳) برێتی لە پیاوی بێ‌ئاوەز؛ ۴) سوُکـەلـەنـاوی کەریم ف ۱) کُند؛ ۲) بکند؛ ۳) کنایە از احمق؛ ۴) مخفّف کریم، نام مردانە.
**کەروُ:** ۱) جاڵجاڵوُکە؛ ۲) داوی جاڵجاڵوُکە ف ۱) عنکبوت؛ ۲) تار عنکبوت.
**کەڕو:** گوندێك لە کوردستان کە بەعسی بە بومبای شیمیایی خەڵکیان کوشتوەو پاشان کاولیان کردوە ف روستایی در کردستان کە مردمش توسط بعثیان با بمب شیمیایی قتل عام شدە وسپس ویران گشتە است.
**کەڕوُ:** ۱) برش، توێژاڵکێ شین کە لە نانی کوّن دەنیشێ؛ ۲) توێژاڵکی ترشاو ف ۱) کفك نان، کپك نان؛ ۲) کَفَك.
**کەروا:** کەربا، بێژو، مەگیرانی، کەرب ف ویار.
**کەڕواوی:** برش هەڵێناو ف کفك‌زدە.
**کەروایی:** مەگیرانی، بێزو، بێزگ ف ویار.
**کەروّز:** گونـدێکی کوردستـانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان کە توسط بعثیان ویران شد.
**کەروشك:** خەروێ، کەروێ ف خرگوش.
**کەڕوڤە:** کڕێوە، بەفری ورد بەباوە ف کولاك.
**کەروکە:** حوّل و گێلوّکە ف هالو.
**کەڕولاڵ:** کەسێ کە نە دەتوانێ ببیسێ نە دەتوانێ قسە بکا ف کرولال.
**کەروڵە:** کەڕەواڵە، هەوێردە ف بلدرچین.
**کەروّن:** ئالودار ف نگا: ئاڵودار.
**کەروەستەك:** کەرترێنە، هەورازی دژوار ف سر بالایی سخت.

**کەڕۆهەڵێنان:** برش هەڵێنان، کەڕواوی بوُن [ف] کپك‌زدن.

**کەڕۆهێنان:** کەڕۆهەڵێنان [ف] کپك‌زدن، کفك برآوردن.

**کەرویێ:** خەرویێ، کەروُشك [ف] خرگوش.

**کەرویێشك:** کەرویێ، خەرویێ [ف] خرگوش.

**کەرویێشکە:** بزوتنەوەی سەوزەی بەهار بە دەم باوە [ف] خرام سبزه از باد.

**کەرویێشکەخەو:** سەرخەو، سوُکەخەو [ف] خواب سبك.

**کەرویێشکە کردن:** بزوتنی سەوزە بە دەم باوە [ف] خرامیدن سبزه از باد.

**کەرە:** ۱) پاشگری بەواتا: ئەنجامدەر: (کارە **کەرەم** بمرێ مشوُرخۆرەم نەمرێ) «مەسەل»؛ ۲) ڕۆنی قاڵ نەکراو؛ ۳) کاورای بێ‌ئاوەز: (میوانی بوُم‌و نان‌و کەرەی نایە بەر دەمم/ئێستەش بە بێ‌موداهەنە مەمنوُنی ئەو کەرەم) «شێخ‌ڕەزا»؛ ۴) بەردەلاّن [ف] ۱) پسـوند فاعلی؛ ۲) کرهٔ خوراکی؛ ۳) یارو خره؛ ۴) سنگلاخ.

**کەڕە:** ۱) کەڕۆ، برش؛ ۲) ئاژەڵی گوێ‌کورت‌و لوُل؛ ۳) فرۆیەك کە لە قەفـەقـامیش‌دا گەرم دەکرێ، قەلەپڕ، قەلەفڕ؛ ۴) کلوەبەفری وردی تەنکـەڵـە: ۵) کاورای گوێ‌نەبیس؛ ۶) ناوچەیەکە لە کوردستان؛ ۷) هەنجیرێ کە ناگاو دەوەرێ [ف] ۱) کفك؛ ۲) بز و گوسفند گوش کوتاه برجستـه؛ ۳) نوعی آغوز؛ ۴) دانه برف نازك و ریز؛ ۵) یاروکره؛ ۶) ناحیه‌ای درکُردستان؛ ۷) انجیری که نارسیده می‌ریزد.

**کەرهـاتن:** ۱) کەربـوُن؛ ۲) چەقینی جگ، تەف‌هاتن [ف] ۱) نگـا: کەربوُن؛ ۲) ایستادن قاپ.

**کەرەب:** جیوەی داریکەو بەقیمەتە [ف] کَهرُبا.

**کەرەباب:** دیقل، دیکل [ف] خروس.

**کەرەبە:** کەرەب، کارەبا [ف] کهرُبا.

**کەڕەپـۆ:** ۱) روەکێکـە لە قامیش دەکا بەرێکی هەیە وەك وردەپەمۆ؛ ۲) داری کۆنی ڕزیو [ف] ۱) نوعی نی که ثمرش به ریزه پنبه می‌ماند؛ ۲) کُندهٔ کهنه و پوسیده.

**کەڕەپو:** کەڕەپۆ [ف] نگا: کەڕەپۆ.

**کەڕەپۆسەر:** برێتی لە بیری سەرسیی کەم‌فام [ف] کنایه از پیر نفهم.

**کەرەپوُل:** دارایی لەمردگ جێماو، میرات، کەلەپوُر [ف] ارث.

**کەڕەپوە:** کەڕەپۆ [ف] نگا: کەڕەپۆ.

**کەرەپیاو:** ۱) پیاوی زۆر ئازاو نەترس؛ ۲) پیاوی بێ‌ئاوەزو کەم‌فام [ف] ۱) شجاع و متهوّر؛ ۲) احمق.

**کەڕەت:** جار، دەحفە، چەل [ف] دفعه.

**کەرەتاو:** کەرەی تاویاوە کە باش قاڵ نەکرابێ [ف] کرهٔ ذوب شده.

**کەرەتو:** کردوُ، کەردوُ، کەرتو [ف] گراز کشاورزی.

**کەرەتە:** پانیەکێش، پاژنەهەڵکێش [ف] پاشنه‌کش.

**کەرەجی:** جۆرێ بەلەمی سەرئاو [ف] قایق کرجی.

**کەرەخنە:** مەقاش، پۆلگر، ماشەی ئاگر [ف] آتش کاو.

**کەرەدان:** کوُپەڵەی کەرەتێکردن [ف] ظرف کره.

**کەرەز:** گیایەکە دەیکرۆژن ئاوێکی شیرنی هەیە [ف] گیاهی است.

**کەرەزەڕی:** زۆرەکی [ف] زورکی.

**کەرەسب:** کەرسەپ [ف] کرفس.

**کەرەسپ:** کەرسەپ [ف] کرفس.

**کەرەستە:** کەرستە [ف] نگا: کەرستە.

**کەرەسە:** کەرستە [ف] نگا: کەرستە.

**کەڕەسیسە:** کلوەبەفری تەنکی ورد، کەڕە [ف] دانه برف ریز سبك.

**کەرەشان:** هەنگوینی ڕەش هەڵگەڕاو [ف] عسل سیاهرنگ.

**کەرەشێر:** دیقل، دیکل، کەرەباب [ف] خروس.

**کەرەشێل:** کەرەشێر، دیکل [ف] خروس.

**کەرەفتو:** ئەشکەوتێکە لە کوردستان ئاسەواری مێژویی تێدا [ف] غاری در کردستان با آثار تاریخی.

**کەڕەفو:** جۆرێ هەنجیر [ف] نوعی انجیر.

**کەڕەك:** ۱) جۆرێ پێشکەی ورد؛ ۲) فەرەنجی بێ‌قوڵ [ف] ۱) نوعی پشهٔ ریز؛ ۲) پالتوی نمدی بی‌آستین.

**کەرە کولان:** کەرەکێوی [ف] گورخر.

**کەڕە کونتێ:** گوێ بەتەواوی کپ، زۆرکەڕ [ف] به‌کلّی ناشنوا.

**کەڕە کەڕە:** بێ‌هەست‌و چرپە: (کەڕە کەڕە هاتن) [ف] بی سر وصدا.

**کەرە کی:** کەرانە، وەك کەر [ف] خرکی، خرصفتانه.

**کەڕە کیفە:** ۱) کەڕو، برش، کەڕە؛ ۲) دۆکەی گیا [ف] ۱) کفك؛ ۲) سپیدك گیاه.

**کەرە کێفی:** خەرگۆڕ، خەرگۆلك [ف] گورخر.

**کەرە کێوی:** کەرەکێفی [ف] گورخر.

**کەرەگا:** ۱) جوانەگایەك کە سواری چێڵ دەبێ؛ ۲) برێتی لە زۆرداری زاڵم [ف] ۱) گاوگشن؛ ۲) کنایه از زورگو.

**کەرەگایی:** زۆری کردن لە زەبوُن [ف] زورگویی.

**کەڕەگۆشە:** نەخۆشی گولی [ف] بیماری جذام.

**کەرەلیاس:** جاڕچی [ف] جارچی، منادی.

**کەرەم:** ۱) بەخشین، دانی بێ‌قەرەبـو؛ ۲) فایدە، بەهـرە: (جلەکانم لە کەرەم کەوتوُن) [ف] ۱) بخشش؛ ۲) فایده.

**کەڕەمار:** ڕەقەمار، کۆرەمار [ف] نوعی مار سمّی.

**کەرەمدار:** جوامێر [ف] سخاوتمند.

**کەرەمکار:** جوامێر [ف] سخاوتمند.

**کەرەمکە:** فەرمودانیشە [ف] بفرمابنشین.

**کەڕەنا:** ۱) جۆرێ شەیپوُری زل؛ ۲) دوکەڵکێشی سەماوەر، بوڕی [ف] ۱) کَرَنا؛ ۲) دودکش سماور.

**کەرەنتو:** ۱) جۆرێ داسی دەم‌پان؛ ۲) ناوی دێ‌یەکە [ف] ۱) نوعی داس لبه‌پهن؛ ۲) نام دهی است.

**کەرەن‌زەر:** جوانی سەوزەرەنگ [ف] گندمگون.

**کەڕەنسۆ:** کەڕەکونتێ [ف] ناشنوای کلّی.

**کەرەنـگ:** ۱) نێری مێشـەنگـوین، کەرمێش؛ ۲) کەنگـر [ف] ۱) زنبورعسل نر؛ ۲) کنگر.

**کەرەواڵە:** ۱) باڵدارێکە لە مراوی دەکا تۆزێ دندوُکی خوارە لە دماوان دەژی؛ ۲) برێتی لە حۆل‌و کەم‌ئاوەز؛ ۳) هەوێردە [ف] ۱) کاروانك؛ ۲) کنایه از ساده‌لوح؛ ۳) بلدرچین.

**کەرەوان:** ۱) کەرلەوەڕێن؛ ۲) کەرەواڵە ف ۱) نگا: کەرلەوەڕێن؛ ۲) بلدرچین.

**کەرەوانکە:** کەرەواڵە ف نگا: کەرەواڵە.

**کەرەوانە:** باڵندەی کەرەواڵە ف بلدرچین.

**کەرەور:** هەوری، ئیسفەنج ف اسفنج.

**کەرەوز:** کەرسەپ ف کرفس.

**کەرەوس:** کەرسەپ ف کرفس.

**کەڕەوڵ:** کەڕو، برش، کەڕە ف کَفَك.

**کەرەوە:** ۱) چەمەرەی دەوری ئەستۆی گاو چێڵ؛ ۲) کەسێ کە داخــراوێ باز دەکــا: (دەرگا **کەرەوە**) ف ۱) چنبـر گردن گاو؛ ۲) بازکننده، گشاینده.

**کەرەوەت:** پێشخانە، کەوشکەن ف راهرو.

**کەرەوێتە:** ئەستۆپێچی فەرەنگی، کراوات، قەرەوێتە ف کراوات.

**کەرەهـ:** چڵکن، گەمار، پیس وپەڵۆخ ف چرکین.

**کەرهەنگ:** کەرەنگ، کەرمێش ف زنبور عسل نر.

**کەڕەهوُ:** بای زۆر گەرمی بەتەوژم ف باد گرم و شدید.

**کەڕەهوُر:** کەڕەهوُ ف بادگرم و شدید.

**کەڕەهەنجیر:** هەنجیرێ کە ناگاو دەوەرێ، کەڕە ف انجیری کە نارسیده می‌ریزد.

**کەرهێ:** جۆرێ گیای شنگ ف نوعی گیاه‌شنگ.

**کەری:** ۱) برێ لە مێگەل، کەرکەپەز؛ ۲) لەت، پاژ؛ ۳) بێ‌ئاوەزی ف ۱) قسمتی از گلهٔ گوسفندان؛ ۲) پاره، قطعه؛ ۳) حماقت.

**کەڕی:** نەخۆشی کپ‌بوُنی گوێ ف بیماری کری.

**کەرێتی:** کاری بێ‌ئاقڵانە ف کار احمقانە.

**کەرێز:** ڕێگەئاوی بەژێر زەویدا کێشراو ف کاریز، قنات.

**کەرێزە:** ۱) کەرێز؛ ۲) ناوی چەنـد ئاوایی لە کوردستـان ف ۱) قنات، کاریز؛ ۲) نام چند روستا در کردستان.

**کەریفۆك:** شەمەتریلکە ف نگا: شەمەتریلکە.

**کەڕێل:** ئاژەڵی کەڕە ف دام گوش کوچك وبرجسته.

**کەڕێلە:** کەڕێل ف نگا: کەڕێل.

**کەریم:** ناوی پیاوانە ف کریم، نام مردانه.

**کەریەتی:** کەرێتی ف نگا: کەرێتی.

**کەز:** ۱) قەوزە؛ ۲) کەژ ف ۱) خزه؛ ۲) بسیارسفیدپوست.

**کەزاخ:** لق و پۆپی داپاچاو ف هرس درخت.

**کەزاختن:** پەرتاوتن ف هرس کردن.

**کەزاخە:** لقێ کە شیاوی هەڵپەرتاوتنە ف شاخه‌ای که باید هرس شود.

**کەزاخەکردن:** هەڵپەرتاوتن، ڕەزبڕین، باغ‌بڕین ف هرس کردن درخت ورز.

**کەزان:** قەزوان، کەسکان ف نانکش.

**کەزباندن:** درۆکردن ف دروغ گفتن.

**کەزخاندن:** کەزاخەکرن، پەرتاوتن، داپاچین ف نگا: داپاچین.

**کەزلاتەی:** کەسەر، مەینەت ف رنج و محنت.

**کەزنەزان:** دەوەنێکە ف درختچه ایست.

**کەزوان:** قەزوان ف نانکش.

**کەزەب:** ۱) جەرگ، جگەر؛ ۲) زەنگەتە ف ۱) جگر؛ ۲) تلسك.

**کەزەلۆق:** گیایەکی بەپنجە ف گیاهی است.

**کەزەلۆك:** کەزەلۆق ف گیاهی است.

**کەزی:** ۱) پرچ، زلف؛ ۲) قەوزە؛ ۳) جەگەن، گیاحەسیر؛ ۴) بناری‌چیا ف ۱) گیسو؛ ۲) خزه، جل‌وزغ؛ ۳) گیاهی است؛ ۴) کمر کوه.

**کەزیك:** گیایەکی دەشتەکیە ف گیاهی است.

**کەزیگە:** ۱) ڕەگی ئەستوُر، شادەمار؛ ۲) جۆی هەڵبەستراو بۆ ئاش ف ۱) شاهرگ؛ ۲) جوی آب پیوسته به ناو آسیا.

**کەزین:** نۆین، جۆگەی داپۆشراو ف جوی سر پوشیده.

**کەژ:** ۱) کژك، کژگ؛ ۲) زۆر سپـی، فریە چەرمــگ؛ ۳) بنیادەمێ کە زگمــاك موی سپیەو چاوی لەبــەر تاو هەڵنــایە؛ ۴) بزنی موسپی ئامــاڵ‌شین؛ ۵) چیا، کۆ؛ ۶) ئــاوریشمی خاو؛ ۷) بزنی مل‌سوُری گوێڕەش؛ ۸) پیاوی موُزەرد؛ ۹) ناوەبۆکچان؛ ۱۰) موی‌بزنەمەرەزە ف ۱) نوار پهن تنگ بند ستور؛ ۲) بسیار سفید؛ ۳) آدم سپید موی مادرزاد، آدم زالی؛ ۴) بز رنــگ سفید مایل به کبـودی؛ ۵) کوه؛ ۶) ابریشم خام، قز؛ ۷) بز گردن سرخ سیاه‌گوش؛ ۸) مردبوُر؛ ۹) نامی زنانه؛ ۱۰) موی مرغوب نوعی بُز.

**کەژاڵ:** ۱) ئاســك؛ ۲) بزنــەکــێوی؛ ۳) ناوە بۆ ژنــان؛ ۴) بزنـی گوێچکەسپی‌وڕەش؛ ۵) چاوکاڵ ف ۱) آهو؛ ۲) بزکوهی؛ ۳) نام زنانه؛ ۴) بز گوش سیاه‌وسفید؛ ۵) چشم آبی.

**کەژاو:** ۱) کەز، قەوزە؛ ۲) توێژاڵکی سوُری سەر ئاو، کاژاو ف ۱) خزه؛ ۲) لایهٔ قرمز بر آب.

**کەژاوە:** ۱) سندوُقی زل کە لەسەر پشتی بارەبەر دادەنراو بنیادەمی تیا سوار دەبـو؛ ۲) دارێ کە لەبن دیوارەوە وەبـەر کاریتـە دەدرێ ف ۱) کجاوه؛ ۲) ستون زیر بالار مماس بر دیوار.

**کەژْك:** کژك، کژگ، کەژ ف نوار پهن تنگه بند ستور.

**کەژْگ:** کەژْك ف نگا: کەژْك.

**کەژۆ:** ۱) ناوی پیاوانە؛ ۲) سپی‌پێست؛ ۳) بزنەمەرەزی زەرد ف ۱) نام مردانه؛ ۲) پوست سفید؛ ۳) بُز کُرك زرد.

**کەژوُ:** کەژْك ف نگا: کەژْك.

**کەژۆك:** ۱) ئاوریشمی خاو، کەژ؛ ۲) جۆرێ نەخـۆشی دەمارتوندبوُنە؛ ۳) بەری گیایەکـە لە لۆکـە دەکـا؛ ۴) ڕەنگی زۆر سپی، قیچ ف ۱) ابـریشم خام؛ ۲) نوعی بیمـاری عروق؛ ۳) ثمر گیاهی است شبیه پنبه؛ ۴) رنگ بسیار سفید.

**کەژە:** ۱) فەســڵی ساڵ، کژ؛ ۲) جۆرێ چەکــوچ کە فیلیان پێ لێ‌دەخوڕی ف ۱) فصل سال؛ ۲) چکش ویژهٔ فیل‌رانی.

**کەژەسەر:** گیایەکە ف گیاهی است.

**کەژەك:** ۱) موی زەردی بزنەمەرەزە؛ ۲) جانەوەری سپی ئاماڵ‌زەرد ف ۱) کُرك زردرنگ بُز؛ ۲) جانور سفید مایل به زرد.

**کەژەڵ:** ۱) پەزی سپی گوێ‌قاوەیی؛ ۲) بزنی کەوەی تاریك؛ ۳) ئاژەڵی

ڕەش و سپی ف ۱) گوسفند سفید گوش قهوه‌ای؛ ۲) بزطوسی پررنگ؛ ۳) بز و گوسفند سفیدو سیاه.

**کەژەوان:** رازەوان ف کوه‌نورد.

**کەژی:** کەژك، کەژۆ ف نگا: کەژك.

**کەژێ:** ۱) ناوی ژنانە، سوکەڵەناوی کەژاڵ؛ ۲) دواندنی کیژی جوان واتا: دەلالامن ف ۱) نام زنانه؛ ۲) عزیزم، کلمهٔ نوازش خانمها.

**کەژین:** تەنراو لە ئاوریشم ف بافته شده از ابریشم.

**کەس:** ۱) تاکێ لە بنیادەم؛ ۲) خزم، خویش؛ ۳) سەرپەرشت ف ۱) کس، شخص: ۲) خویش، قوم؛ ۳) سرپرست.

**کەسا:** ۱) کیسەڵ، کێسو، کوسی؛ ۲) برێتی لە کورتەبنەی قەڵەو ف ۱) لاك پشت؛ ۲) کنایه از تو پولی.

**کەساپ:** کۆسپ، زەمەندو دارستانی چوغور ف راه دشوار و جنگلی.

**کەسات:** بێ‌برەو، بێ‌ڕەواج ف کساد، بی‌رونق.

**کەساخ:** ۱) کەزاخ، پەرتاوتن؛ ۲) جاش‌پاڵتە، عەبای قوڵەکەدەگاتەسەرزرانی ف ۱) هرس درخت؛ ۲) عبای کوتاه.

**کەساخە:** جاش‌باڵتە ف عبای کوتاه.

**کساخ:** کەزاخ ف هرس درخت.

**کەساس:** ۱) کەسات؛ ۲) حاڵ‌پەرێشان، بێ‌سەرەوبەرە ف ۱) کساد؛ ۲) پریشان‌حال.

**کەسافەت:** پیسی، چڵکنی ف پلیدی.

**کەسان:** ۱) خەڵکان؛ ۲) خزمان؛ ۳) کسان، چلۆن؟ ف ۱) مردم؛ ۲) خویشان؛ ۳) چگونه؟.

**کەساندن:** ۱) سەرپەرشتی کردن، مشورلێ‌خواردن؛ ۲) خاترجەم‌کردن؛ ۳) گۆشت‌وشك کردنەوەو دەمەشکەکردن بۆ زستان ف ۱) سرپرستی کردن؛ ۲) اطمینان دادن؛ ۳) گوشت را برای زمستان خشك و در مشك کردن.

**کەسایەتی:** خزمایەتی ف خویشاوندی.

**کەسب:** کسب، کاسبی ف کسب.

**کەسپ:** ۱) کسب؛ ۲) کۆسپ؛ ۳) سەربان تەپاندنەوە ف ۱) کسب؛ ۲) مانع سرراه؛ ۳) کوبیدن پشت بام با لگد.

**کەسپك:** شەیتانۆکە ف حلزون.

**کەسپۆ:** دەنکەخورما ف هستهٔ خرما.

**کەسپەر:** ۱) چاوشین؛ ۲) چاوکاڵ ف ۱) چشم سبز، ۲) چشم زرد.

**کەسپەرە:** جۆرێ ساچمەتفەنگی درشت ف نوعی ساچمهٔ درشت برای تفنگ ساچمه‌ای.

**کەست:** ۱) ناشیرین، نەجوان؛ ۲) کاری خراپ ف ۱) بدگل؛ ۲) کار زشت.

**کەستانە:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**کەستك:** سندە ف کلوخ.

**کەستور:** جۆرێ کوتاڵە ف نوعی قماش.

**کەستەك:** ۱) سندە؛ ۲) قورسە، دەقاڵب‌کراوی توندەوەبوگ لەکانزا ف ۱) کلوخ: ۲) شِمش.

**کەسخ:** ۱) کخس، خیسکە، خسکە؛ ۲) کەزاخ ف ۱) پیاز کاشتنی؛ ۲) هرس درخت.

**کەسخاندن:** کەزاختن ف هرس کردن.

**کەسداندن:** هەڵگرتنی گۆشت لە پێستەدا بۆ زستان ف نگهداری گوشت در چرم دبّاغی شده برای زمستان.

**کەسرەوان:** شەدەو هەوری لێك‌هاڵاوی سەری خانمان ف روسری بافتهٔ خانمها.

**کەسك:** سەوز، بەڕەنگی گیا ف سبزرنگ.

**کەسکاتی:** سەوزایی دەشت‌و دەر ف نمای سبز دشت.

**کەسکان:** قەزوان ف نانکش.

**کەسکان کروژ:** مەلێکی بچوکە. *ئەویندای شلکەقەزوانە* ف پرنده‌ای است کوچك.

**کەسکاو:** چێشتی سلق ف آش «سلق».

**کەسکوسۆر:** ۱) کۆلکەزێڕینە، پەلکەزێڕینە، پەلکەڕەنگینە؛ ۲) سەوزو سوری تێکەڵاو ف ۱) رنگین کمان؛ ۲) سبز و سرخ با هم.

**کەسکوسۆر:** کەسکوسۆر ف نگا: کەسکوسۆر.

**کەسکۆن:** ۱) تیر، خەست: (ماستاوێ **کەسکۆن**مان خوارد، چایەکی **کەسکۆن** تێکە)؛ ۲) چێژەتوند: (سرکەیەکی **کەسکۆنە**)؛ ۳) برێتی لە تەڕدەماخ ف ۱) غلیظ، نقطه مقابل آبکی؛ ۲) تندمزه؛ ۳) کنایه از دلخوش.

**کەسکۆیی:** ڕەنگی ئاماڵ‌سەوز ف سبزفام، مایل به سبزی.

**کەسکە:** ۱) شینکەی بەهاران؛ ۲) برێتی لە ژنی زمان‌درێژ ف ۱) سبزهٔ بهاران؛ ۲) کنایه از زن زبان‌دراز.

**کەسکەتاری:** کەسکی تۆخ ف سبز تیره.

**کەسکەزەلال:** کەسکی ئاچوخ ف سبز روشن.

**کەس کەس:** پشێوی‌و هەرکەسە بۆ خۆی: (شەممە بە **کەس کەس**) ف هرکی هرکی، آشفته‌بازار.

**کەس کەسانێ:** ۱) کەس کەس؛ ۲) تکاو کارپێك‌هێنان بۆ خزم‌و ئاشنا ف ۱) هرکی هرکی؛ ۲) پارتی‌بازی.

**کەسکەسۆر:** کۆلکەزێڕینە، پەلکەزێڕینە ف رنگین کمان.

**کەسکی:** سەوزایی ڕەنگ ف سبزرنگی.

**کەسکین:** ۱) کەسکۆن؛ ۲) برێتی لە پیاوی توندەمیزاج ف ۱) نگا: کەسکۆن؛ ۲) کنایه از تندمزاج.

**کەسکێن:** ڕەنگ‌سەوز ف سبزرنگ.

**کەسم:** ۱) تەحر، سەروسیما، بیچم، شکڵ؛ ۲) خزمی من ف ۱) ریخت، قیافه؛ ۲) خویشاوند من.

**کەسموك:** مرۆی هەمیشە تەنگەنەفەس‌و پشوسوار ف شخص مبتلا به تنگی نفس، نفس تنگ.

**کەسمە:** ۱) جۆرێ نانی بەڕۆنی؛ ۲) خزمی منە؛ ۳) نەخۆشیەکی کەپۆی یەکسم؛ ۴) هەڵوای بەدۆشاو ف ۱) نوعی نان روغنی؛ ۲) خویشاوند من است؛ ۳) نوعی بیماری بینی ستور؛ ۴) حلوای ساخته‌شده از

شیرهٔ انگور.

**کەسناو:** سەرناو، نازناو ف لقب، کنیه.

**کەس نەبینە:** گۆڕینەوەی شت بە بێ دیتن ف نادیده معاوضه کردن.

**کەس نەدار:** شتێ کە خەڵکی تر نەیبێ ف نادر.

**کەس نەزان:** ۱) نامەعلوُم؛ ۲) ناوی دێیەکە؛ ۳) گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف ۱) مبهم؛ ۲) نام دهی است؛ ۳) نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**کەس نەناس:** ناناشنا، غەریبە ف ناشناس.

**کەس نەویست:** خوێنتاڵ لای هەموکەس ف کس نخواه.

**کەسوکار:** خزم و قوم ف قوم و خویش.

کەسە: کەسا، کیسەڵ ف لاک پُشت.

**کەسها:** پر رزەی بنی سەلکە پیاز ف ته پیاز.

**کەسەپشت:** کسل، کیسەڵ، کێسوُ ف لاک پشت.

**کەسەخ:** جۆرێ پاڵتاوی لەخوری دەسکری خێزانی ماڵ ف نوعی پالتو پشمینه.

**کەسەر:** خەم، خەفەت ف اندوه.

**کەسەرڤەدان:** ئاخ هەڵکێشان ف آه حسرت سردادن.

**کەسەک:** ۱) کەستەک؛ ۲) قفل، گوڵە؛ ۳) ئالقەریزی درگا ف ۱) نگا: کەستەک؛ ۲) قفل؛ ۳) جاقفلی دَر.

**کەسەل:** کیسەڵ، کەسا ف لاک پشت.

**کەسی:** تایبەتی بە بنیادەمێ: (**کەسی** یە هەموانی نیە) ف شخصی، ویژهٔ شخص.

**کەسێ:** بنیادەمێک ف کسی.

**کەسێتی:** بوُن وەک بنیادەمی ماقوُل، شەخسیەت ف شخصیّت.

**کەسیرە:** تەزیو لەسەرمان ف کرخیده از سرما.

**کەسیف:** پیس، چڵکن ف کثیف.

**کەسین:** ۱) کسان؟، کوسان؟؛ ۲) خۆیی، شەخسی ف ۱) چگونه؟؛ ۲) شخصی، خصوصی.

**کەش:** ۱) تەڕایی زەوی کە دەخڵی پێ بڕوێ، شەی عەرز: (زەویەکە کەشی هەیە دەڕوێنێ)؛ ۲) پەڵەهەوری بەبارشت: (**کەشە**هەورێکی هێناو باری)؛ ۳) چیا، کەژ؛ ۴) بن باخەڵ؛ ۵) ئەستێرەیەکی گەڕۆکە زۆر بەتیشکە؛ ۶) باوەش، تامێز، سەرزان، کۆش؛ ۷) تێکشانی تیر لە ئامانج؛ ۸) ڕاکێشان؛ ۹) چلۆنایەتی هەوا: (**کەش** گەرمە)؛ ۱۰) کەس، بنیادەم؛ ۱۱) ئەوپارچەزیادەی جلدور دیداتەوە؛ ۱۲) وڵسات و ئاژەڵی نێر کە بۆ تۆم لێ گرتنەوە ڕادەگیرێ ف ۱) نم زمین که غلّه برویاند؛ ۲) قطعه ابر بارنده؛ ۳) کوه؛ ۴) زیر بغل؛ ۵) ستاره ایست درخشان؛ ۶) آغوش؛ ۷) انحراف تیر از هدف؛ ۸) کش از کشیدن، جاذبه؛ ۹) وضع هوا؛ ۱۰) کس، شخص؛ ۱۱) اضافه پارچه‌ای که خیاط پس می‌دهد؛ ۱۲) حیوان نر که برای تخم‌کشی نگهداری می‌شود.

**کەشاکەش:** نێوان ناخۆشی و زەناو چەقە ف کشاکش.

**کەشان کەشان:** ڕاکێشان بە زەویدا ف کشان کشان.

**کەشانی:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**کەشاو:** ئاو لەزەوی‌نان بۆ ئاوەنیا ف آبیاری قبل از شخم و بذرافشانی.

**کەشتەنگ:** وەڕەز ف عصبانی.

**کەشتی:** خانـوێکی ئاسنین یادارینی زۆر فروان بەسـەر دەریاوە بۆ سەفەرو بار، گەمی، گەمیە، پاپۆڕ ف کشتی.

**کەشتی ڤان:** کەسێ کەشتی دەئاژوێ، پاپۆڕەوان ف ناخدا.

**کەشتی گەل:** ۱) کاروانـە کـەشتی؛ ۲) هێزی دەریایی ف ۱) کاروان کشتی‌ها؛ ۲) نیروی دریایی.

کەشتیلە: ئەسکوێ ف ملاقه.

**کەشتێلەسەرە:** ۱) کەچکەقوڵە؛ ۲) سەرمازەڵە ف ۱) بچه‌قورباغهٔ توی پوسته؛ ۲) چلپاسه.

**کەشتی وان:** کەشتی ڤان ف ناخدا.

**کەشتیەوان:** کەشتی ڤان ف ناخدا.

**کەشخە:** ڕێک و جوان لەبەرچاو ف خوش نمود، شیک.

**کەشخەیی:** ۱) ڕێکی و لەبەرچاوی؛ ۲) بریتی لە فیزو دەعیە ف ۱) شیکی؛ ۲) کنایه از متکبّر.

**کەشف:** ۱) کەراماتی شێخان؛ ۲) ئاشکرا، خۆیا، کفش ف ۱) کرامت اولیا؛ ۲) آشکار، پیدا.

**کەشک:** ۱) شیرێژی بەتـەڕی گوشـراوی وشکەوەکراو؛ ۲) سپی؛ ۳) کاسەی زرانی؛ ۴) جومگەی دەست و پا ف ۱) کشک؛ ۲) سفید؛ ۳) کاسهٔ زانو؛ ۴) مُچ دست و پا.

**کەشکـان:** لەو گوندانـەی کوردستانـە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**کەشکانا:** خۆزبا، بریا، کاشکا ف ای کاش.

**کەشکاو:** دۆکەشک ف دوغ کشک.

**کەشکاوە:** گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**کەشک پا:** کاسەی زرانی ف کاسهٔ زانو.

**کەشکوسوُر:** کەسکوسوُر ف سبز و قرمز.

**کەشکـۆل:** ۱) فینجانی فەغفوری؛ ۲) قاپێلکی میوەیەکە دەروێشان دەسگـرەی زنجیری تێ‌دەخـەن و سواڵی پێوە دەکەن؛ ۳) بەرموُری زاروکـان؛ ۴) دەفتەری بیرەوەری و شێعران؛ ۵) ئەنخشێکە لە جاجم و بەرمـاڵدا ف ۱) فنجـان چینی؛ ۲) کشکـول درویش؛ ۳) گردنبنـد کودکان؛ ۴) دفتر شعر و خاطرات؛ ۵) نقشی در جاجیم و جانماز.

**کەشکۆڵ:** کەشکۆل ف نگا: کەشکۆل.

**کەشکە:** ۱) پوکاوڵە، چەمبوڵە؛ ۲) چڵم؛ ۳) دۆخوای دۆکەشک ف ۱) ام؛ ۲) آب بینی؛ ۳) نوعی آش.

**کەشکەخۆرە:** مەلێکی سپی و ڕەشە. *خواردنی هەر ئێسقانە* ف پرنده‌ای است سفید و سیاه که از استخوان تغذیه می‌کند.

**کەشکەزرانی:** کەشک پا، کاسەی ئەژنۆ ف کاسهٔ زانو.

**کەشکەزەنگوڵ:** کەشکەزرانی ف کاسهٔ زانو.

**کەشکەژنۆ:** کەشکەزرانی ف کاسهٔ زانو.

**کەشکەسەرە:** ۱) سەرمازەڵە؛ ۲) کەچکەقوڵە [ف] ۱) چلپاسە؛ ۲) کفچلیزك.

**کەشکەشان:** کادز، کاکەشان، کاکێشان [ف] کهکشان.

**کەشکەك:** ۱) چێشتی گەنمەکوتاو، هەریسە؛ ۲) کاسەزرانی [ف] ۱) آش حلیم؛ ۲) کاسۀ زانو.

**کەشکەڵان:** کەشکەشان [ف] کهکشان.

**کەشکین:** ۱) دۆکـەشك؛ ۲) چێشتی کەشکان [ف] ۱) دوغ کشك؛ ۲) آش کشك.

**کەشگە:** کلاژدم، دوپشك [ف] عقرب.

**کەشگەك:** کاسەزرانی، کەشکەژنۆ [ف] کاسۀ زانو.

**کەشم:** جوانیو نازو عیشوە، دەگەڵ نەشم دەگوترێ: (چەند بە **کەشمو** نەشمە) [ف] زیبایی و ناز و عشوه.

**کەشماکەش:** کەشاکەش [ف] کشاکش.

**کەشمان:** تەناف کێشان لە دولاوە [ف] مسابقۀ طناب کشی.

**کەشمانهاتن:** درێژ بوُنەوە بە هۆی کێشان [ف] کش آمدن دراثر کشیدن.

**کەشموُن:** هێشوە هەنگوری لەدار وەریو بەرلە گەیشتن [ف] غورۀ از مو ریخته.

**کەشمونەشم:** نازو قەمزە [ف] ناز و غمزه.

**کەشمەکەش:** کەشاکەش [ف] کشمکش.

**کەشوتوُش:** قیلەو قانج [ف] اریب بری.

**کەشوشکە:** خەزایی، عایلەمەن، عەینەمەل [ف] سار ملخ‌خوار.

**کەشوفش:** فیزو ئیفادە [ف] کش وفش، فیس و افاده.

**کەشوقنگ:** کەشوفش [ف] کش و فش.

**کەشۆل:** گاگۆز، پۆلکە، شۆقل [ف] نخود فرنگی.

**کەشۆیلە:** خەزایی، عایلەمەن [ف] سار مَلَخ‌خوار.

**کەشە:** ۱) ئاخونی خاچ‌پەرستان؛ ۲) تێلای لەدەستان‌خۆش‌و بێ گرێ؛ ۳) برێتی لە کێر؛ ۴) جار، چەل؛ ۵) قاشەماسی؛ ۶) نیشانەی «ـ» [ف] ۱) کشیش؛ ۲) چوبدست هموار؛ ۳) کنایه از آلت تناسلی نرینه؛ ۴) بار، دفعه؛ ۵) نوعی ماهی؛ ۶) علامت مدّ (ـ).

**کەشها:** کشا، رەکێش بو [ف] کشیده شد.

**کەشهاتن:** ۱) پنـدربـوُنـەوەی زەوی پاش ئاوداشتن؛ ۲) درێژبوُنەوە بەهۆی کشاندن [ف] ۱) آماده‌شدن زمین آبیاری شده برای شخم؛ ۲) کش آمدن دراثر کشیدن.

**کەشهاتنـەوە:** پندربوُنەوەی زەوی ئاودراو [ف] آماده‌شدن زمین پس از آبیاری برای شخم.

**کەشەدەرە:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد [ف] نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**کەشەف:** سینی درێژۆکە بۆ پیاڵەو ئیستیکان [ف] سینی کوچك.

**کەشەگەڕە:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد [ف] نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**کەشەنگ:** شەکەت [ف] خسته و کوفته.

**کەشەهەور:** پەڵەهەور [ف] لکه ابر.

**کەشیدە:** ۱) بزاوی بڵندکردنی دەنگ لەسەر پیت، بەرانبەری داکشاو؛ ۲) پێچی زەردی حاجی؛ ۳) زللە، شەقام [ف] ۱) علامت مدّ بر حروف؛ ۲) عمّامۀ زرد حاجیان؛ ۳) سیلی.

**کەشیش:** ۱) کەشەی خاچ‌پەرستان؛ ۲) دەویت [ف] ۱) کشیش؛ ۲) قرمساق.

**کەشینە:** جۆرێ ماسی کە لە ئاوی شیریندا دەژی [ف] نوعی ماهی.

**کەعن:** کۆن، کەون [ف] قدیمی.

**کەف:** ۱) شتێکی سپیو لیچقە لە سابوُن یان ئەسپۆن کە دەئاو دەخرێن پەیدا دەبێ؛ ۲) سپیایی بڵق‌دار کە لە کوڵانی چەوراو دێتـە سەر؛ ۳) سپیەکە تەوژمی شەپۆلی چەم دەیپرژێنێ؛ ۴) تفێکی سپیە پیاوی زۆر توُڕە یان شێتو فێدار دێتە سەر لێویان؛ ۵) پەراوێز، کەنارە؛ ۶) لەپی دەست [ف] ۱) کف صابون؛ ۲) کف غذای جوشیده؛ ۳) کف موج آب؛ ۴) کف دهان انسان؛ ۵) کناره، حاشیه؛ ۶) کف دست.

**کەفارەت:** ۱) تۆڵەی تاوان؛ ۲) جوت‌قۆشەیی، شوُمی [ف] ۱) کفاره؛ ۲) بدیمنی.

**کەفارەتدار:** بنیادەمی بێ‌فەڕو شوُم [ف] آدم بدیمن.

**کەفارەتی:** کەفارەتدار، شوُم [ف] نحس.

**کەفاك:** تەیڵەسەر، تۆقەسەر [ف] تارك سر.

**کەفـاندن:** ۱) دروُنەوەی دەوری جلك؛ ۲) پەراوێزگرتن [ف] ۱) سجاف دوختن؛ ۲) حاشیۀ لباس را دوختن.

**کەفاو:** کەفی سابوُن یان ئەسپۆن دەگەڵ ئاو [ف] کفابه.

**کەفپڕژاندن:** ۱) کەف لەلێو دەرپەڕین؛ ۲) کەف لە شەپۆل جیابوُنەوە [ف] ۱) کف بر لب آوردن؛ ۲) کف‌اندازی موج.

**کەفپڕژێن:** شەپۆلاوێ کە کەف بڵاو دەکاتەوە [ف] موجی که کف‌پراکند.

**کەفتار:** قەمتار [ف] کفتار.

**کەفتارۆ:** کەفتار، قەمتار [ف] کفتار.

**کەفتانی:** جۆرێ سەبیلەی کللك‌درێژ [ف] نوعی چپق دسته‌دار.

**کەفتگ:** بەرەوەبوُگ بۆ سەر زەمین [ف] افتاده.

**کەفتن:** ۱) بەربوُنەوە بەزەویدا؛ ۲) برێتی لە بێ‌حورمەت‌بوُن؛ ۳) برێتی لە نابـوُت‌بوُن [ف] ۱) افتـادن؛ ۲) کنایه از بی قدرشدن؛ ۳) کنایه از ورشکست شدن.

**کەفتو:** کەفتگ [ف] افتاده.

**کەفتولەفت:** ۱) دەمەقاڵە، شەڕەقسە؛ ۲) تەقالاو کۆششت [ف] ۱) جَدَل؛ ۲) کوشش، تلاش.

**کەفتە:** ۱) کەفتگ؛ ۲) قەڵشاو [ف] ۱) افتاده؛ ۲) شکافته.

**کەفتەدان:** رەنج‌دانو چەوسانەوە [ف] زحمت کشیدن و آزار دیدن.

**کەفتەر:** کەفۆك، کۆتر [ف] کبوتر.

**کەفتەکار:** لەکارکەوتو [ف] ازکار افتاده.

**کەفتەلەفت:** ۱) حەولو تەقالای زۆر؛ ۲) خەباتی سەخت‌و دژوار [ف] ۱) تلاش بسیار؛ ۲) مبارزۀ سخت و دشوار.

**کەفتەیی:** نەخۆشی گرانەتا [ف] بیماری تیفوس.

**کەفتی:** کەفتو، کەفتگ [ف] افتاده.

**کەفتیار:** قەمتار، کەفتار ف کفتار.

**کەفچ:** دمخوار ف دهن کج.

**کەفچاندن:** کەف پرژاندن ف نگا: کەف پرژاندن.

**کەفچر:** کەف پرژێن ف کف انداز.

**کەفچرێن:** کەفچر ف کف انداز.

**کەفچك:** کەچك، قاشوخ ف قاشق.

**کەفچە:** دەمخوار ف دهن کج.

**کەفچەر:** کەف پرژێن، کەفچر ف کف انداز.

**کەف چەراندن:** کف پراکندن.

**کەف چەرێن:** کەف چر، کەف چرێن ف کف انداز.

**کەفچی:** کەچك، قاشوخ ف قاشق.

**کەفخوێ:** کوێخادێ، قوخای گوند ف کدخُدا.

**کەفخوی:** کەفخوێ ف نگا: کەفخوێ.

**کەف دەڤ:** ١) ئاو لە کەپوو هاتن؛ ٢) لیکاوی دەم ف ١) آب ریزش بینی؛ ٢) لعاب دهان.

**کەفر:** بەردی زەلام، گاشەبەرد ف صخره.

**کەفرتاش:** بەردتاش ف سنگتراش.

**کەفرتەراش:** کەفرتاش ف سنگتراش.

**کەفرێژ:** پراوپر ف لبریز.

**کەفز:** کەن، قەوزە ف خزه.

**کەفزە:** کەفز، قەوزە ف خزه.

**کەفزەر:** ١) قەوزە؛ ٢) جلەی داربی ف ١) خزه؛ ٢) جُل وزغ.

**کەفش:** ١) پەیدا، خۆیا، کفش؛ ٢) پێلاو، قوندرە؛ ٣) کەش، بن باخەڵ ف ١) کشف؛ ٢) کفش؛ ٣) زیر بغل.

**کەفشو:** شەمێلەو کزنی کولاو کە ئەدرێ بە گا ف حبوب آب‌پز برای گاو.

**کەفشە:** قژن ف ژولیده موی.

**کەفشیف:** سوێنەی کەشك تێدا سوُنەوە ف ظرف مخصوص کشک مالی.

**کەفشێل:** ئاوێ کە لە سوُچی دەم دێ لە نەخۆشی یان لە ئیشتیای شتێك ف لعاب دهن.

**کەفشیو:** کەفشیف ف نگا: کە فشیف.

**کەفك:** جۆرێ قوُچەکەی جلدرو کە دەناو لەپی دەگرن ف از وسایل خیّاطی.

**کەفکانی:** قوچەقانی، قەلماس، قەلماسك، بەرەقانی ف فلاخن.

**کەفکەفوك:** ئەسپوُن، سپوُن ف چوبك، اشنان.

**کەفگیر:** ئامرازێکی کانزای کون کونی کلکدارە بو پالاوتنی کەف لەسەر چێشت ف کفگیر.

**کەفلەسنێ:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی درکردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**کەفلەمە:** کەپلەمە ف نگا: کەپلەمە.

**کەف لێدان:** خواردنی بێ ئیجازەی خاوەن ف ناخنك زدن.

**کەفمال:** بە دەست دامالین ف ماساژ.

**کەفوکول:** ١) کەفی سەر چێشت لە کاتی جۆشیندا؛ ٢) برێتی لە کینەو رق ف ١) کف مایع در حال جوشیدن؛ ٢) کنایه از قهر و غضب.

**کەفە:** ئاسنێکە پالاندرو دەیکاتە دەستی بوّ پالپێوەنانی شوُژن ف آهن کف دست پالاندوز.

**کەفەرێژ:** کەفرێژ ف لبریز.

**کەفەژیلکە:** گوّشتی چەقالتە ف گوشت سست‌وپر رگ.

**کەفەل:** سمتی یەکسم ف کفل.

**کەفەلوُك:** شتی شل‌و سستی ناپتەو ف متخلخل.

**کەفەلوّك:** کەفەلوُك ف متخلخل.

**کەفەلوُکە:** کەفەلوُك ف متخلخل.

**کەفەلولکە:** چەرمەچەقالتە، چەقالتە ف گوشت سست و پر رگ.

**کەفەن:** ١) جلکی مردگ؛ ٢) برێتی لەشتی زوّرچەرمگ ف ١) کَفَن؛ ٢) کنایه از شییء بسیار سفید.

**کەفی:** دەسەسر ف دستمال.

**کەفی دەریا:** ١) دەرمـانێکـە؛ ٢) شتێکی شل‌و کون کونـە لە دەریاوە دەهێنرێ سابوُنی لێدەدەن‌و دەم‌و چاوی پێ دەشوُن ف ١) کف دریا، دارویی است؛ ٢) ابرمرده، اسفنج.

**کەفیك:** دەسەسر ف دستمال.

**کەفیل:** دەستەبەر، زامن ف ضامن.

**کەفێل:** کەفیل ف ضامن.

**کەفیوك:** دەسەسری بچوُك ف دستمال کوچك.

**کەفیە:** کەفی، دەسەسر ف دستمال.

**کەڤ:** ١) باڵـدارێکی رەنگین‌و جوانـە لە کوّتـر زلتـرە دەنگی خوّشەو گوّشتیشی خوّشە، ژەرەژ؛ ٢) کەللەبێژنگ‌و دەف‌و... ف ١) کبك؛ ٢) چنبرهٔ غربال و دف و...

**کەڤـا:** ورتکـەنانی تەنك کە بوّ چینەی باڵندەی دەرێژن ف ریزنانی که برای پرندگان می‌ریزند.

**کەڤارك:** کارگ، کوارگ، قارچ، قارچك ف قارچ.

**کەڤاشتن:** کەتاندن، وردوردقرتاندن ف قطعه‌قطعه کردن.

**کەڤال:** دەستەیەکی پچوُك لە پەز ف بخشی اندك از گله.

**کەڤـان:** ١) دارێکی چەماوە ژێی پێوەیە تیری پێ داوێژن؛ ٢) ئامرازی کولکەشی کردنەوە ف ١) کمان تیراندازی؛ ٢) کمان پنبه‌زن.

**کەڤانژەن:** کەسێ کە کولکە بە کەڤان شی دەکاتەوە، هەلاج ف پنبه‌زن.

**کەڤانوك:** تاقی سەر دەروازە ف طاق سردر.

**کەڤـانـە:** ١) خوار وەك کەڤان؛ ٢) برێتی لە تاقی پردو شتی تر ف ١) کمانه؛ ٢) کنایه از طاق پُل و امثال آن.

**کەڤانی:** کەبانو، کابان ف کدبانو.

**کەڤتـار:** ١) کەمتیار؛ ٢) زوّر پیر و لەکـارکـەوتـە؛ ٣) کەسێ کە لەبـەر پرگوّشتی بەسـەبـروّکە دەروا ف ١) کفتار؛ ٢) پیر از کار افتاده؛ ٣) کسی که از فرط چاقی آرام قدم بردارد.

**کەڤتـــك:** ١) کفی، کەفیە، دەســەســر، دەســـرە؛ ٢) کوفیە، جوّرێ سەرپوّشی ژنان ف ١) دستمال؛ ٢) نوعی لچك زنانه.

**کەڤجیرْك:** پوّر، باڵندەیەکە لە کەو زلترەو خال‌خالە ف پرنده‌ای است.

**کەڤچ:** ١) خوار، چەفت؛ ٢) کەچك ف ١) کج؛ ٢) قاشق.

**کەڤچی:** ١) کەچك؛ ٢) چەوتی ف ١) قاشق؛ ٢) کجی.

**کەڤر:** ١) بەرد؛ ٢) بەردی زل ف ١) سنگ؛ ٢) صخره.

**کەڤرا:** بێزو، مەگیرانی، کەربا، کەرب، بێزگ ف ویار.

**کەڤران:** بەردگەل ف سنگها.

**کەڤراندن:** بەردەباران کردن، سەنگەسارکردن ف سنگسارکردن.

**کەڤرتاش:** بەردتراش ف سنگتراش.

**کەڤرکانی:** قوچەقانی، بەرەقانی، قەڵماسك، کەفکانی ف فلاخن.

**کەڤروێشك:** کەروێشك، خەروێ، کەوریشك ف خرگوش.

**کەڤروك:** بەردەڵان ف سنگلاخ.

**کەڤرە:** کەڤروك، بەردەڵان ف سنگلاخ.

**کەڤری:** کەڤرە ف سنگلاخ.

**کەڤـــز:** ١) قەوزە؛ ٢) سەوزەڕەنــگ؛ ٣) بۆگەن ف ١) جُل وزغ؛ ٢) سبزرنگ؛ ٣) بوگند.

**کەڤزین:** بۆگەنبوونی ئاوی ڕاوەستاو ف گندیدن آب راکد.

**کەڤژال:** ١) قرژانگ، قرژاڵ؛ ٢) چەخماخی تفەنگ ف ١) خرچنگ؛ ٢) چخماق تفنگ.

**کەڤشك:** قریژی سەر، کریژی سەر ف شورهٔ سر.

**کەڤك:** ١) بۆسۆ؛ ٢) کەچك ف ١) بوی پنبهٔ سوخته؛ ٢) قاشق.

**کەڤگیر:** کەفگیر ف کفگیر.

**کەڤـل:** ١) پێستی لەحەیوان دارنداو؛ ٢) عابای تیسکن لە پێستەبەزو بەرخ؛ ٣) کەتایی دەمی تیخ ف ١) پوست؛ ٢) پوستین؛ ٣) شکستگی لبهٔ تیغ.

**کەڤل کرن:** پێستدارنینی حەیوان ف پوست کندن.

**کەڤلۆ:** تیخی کەت ف تیغ لبەشکسته.

**کەڤن:** کۆن ف کهنه.

**کەڤنار:** زۆر کۆن، دێرینە ف باستانی.

**کەڤنارا:** کەڤنار ف باستانی.

**کەڤنارك:** عەتیقە، شتی زۆر لە مێژینەو بەقیمەت ف عتیقه.

**کەڤنسال:** بەتەمەنداچو، پیر ف کهنسال، پیر.

**کەڤنك:** ١) چارەکەی تەنکی سەری ژنان؛ ٢) جلکی شڕ و کۆن ف ١) سرپوش نازك زنانه؛ ٢) لباس مندرس.

**کەڤنکێ پیرێ:** جۆلاتەنەی جاڵجاڵۆکە ف تار عنکبوت.

**کەڤنـەژن:** ١) ژنی زۆر عومـر کـردو؛ ٢) ژنی پێشـوی مێرد ف ١) زن کهنسال؛ ٢) زن قبلی مرد.

**کەڤنەشوێ:** ١) شوێنی پێی پێشینە؛ ٢) برێتی لە سەرگوروشتەو چیرۆك ف ١) رد پای گذشتگان؛ ٢) کنایه از قصّه.

**کەڤنەمژی:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**کەڤنی:** جاڵجاڵۆکە، پسپسەکوڵە ف عنکبوت، تارتنك.

**کەڤنین:** شوێنەواری کەون ف آثار باستانی.

**کەڤۆت:** دارێکە زۆر سەخت ف درختی است جنگلی.

**کەڤۆك:** کابۆك، کۆتر، کاڤۆك ف کبوتر.

**کەڤۆکرك:** قومری، جۆرێ کۆترەباریکە ف قمری، یاکریم.

**کەڤەر:** ١) بەندەن، قەدی کێو؛ ٢) سپیواش؛ ٣) بزنی بەڵەك؛ ٤) بزنێ کە گوێچکەی پنوك‌پنوکە؛ ٥) سەوزی‌یەکی خواردنە ف ١) کمرکوه؛ ٢) سپیده‌فام؛ ٣) بزدورنگ؛ ٤) بزی که گوشش لکه‌های سفید و سیاه دارد؛ ٥) تره.

**کەڤەز:** بەڵەك و پنوك‌پنوك، چیل‌چیل ف خالدار.

**کەڤـەژ:** ١) توێخی پێست؛ ٢) سوتانی پێست ف ١) روی پوست؛ ٢) سوختن پوست.

**کەڤەل:** عەیارە، کەڤل ف پوست دام.

**کەڤەندەکۆ:** برێتی لە عاسمان ف کنایه از آسمان.

**کەڤی:** ١) ڕنـو، کڵێڵە، شاپـە، شەپە، ڕنی؛ ٢) چەمەرەی دەوری دەف و بێژنـگ‌و...؛ ٣) گیایەکە؛ ٤) کەدی، حەمایەت؛ ٥) لێواری دەفر؛ ٦) قەراغ ئاو، کەناراو؛ ٧) تەختی لەسەردانیشتن ف ١) بهمن؛ ٢) دایرهٔ چوبین دف و غربـال و...؛ ٣) گیاهی است؛ ٤) اهلی،رام؛ ٥) لبهٔ ظرف؛ ٦) ساحل، کنار آب؛ ٧) تخت و کُرسی مخصوص نشستن.

**کەڤی ڕەش:** بەفرێکە تا هاوین بەچیاوە مابێ ف برفی که تا تابستان آب نشده باشد.

**کەڤیز:** پێوانەیەکی دەخڵە ف قفیز.

**کەڤیژ:** کەڤیز ف قفیز.

**کەڤیشتن:** زیخەڵان، جێ‌ڕەلم ف ریگزار.

**کەڤیلوك:** کەڤی، لێوارەی دەفر و ئامان ف لبهٔ ظرف.

**کەڤیلە:** کەویەبەفر، ڕنو، ڕنی، شاپە، کڵێڵە ف کولاك.

**کەڤینك:** پێچی سەری پیاوان، شاشك ف دستار مردانه.

**کەك:** ١) کاك، براگەورە؛ ٢) وشـەی حورمەت بۆ پیاو؛ ٣) قیچ ف ١) برادر بزرگ؛ ٢) کلمه‌ای به جای آقا؛ ٣) کك.

**کەکا:** شیرینی بە زاراوەی زارۆکان ف شیرینی به لهجهٔ کودکانه.

**کەکرە:** گیایەکی زۆرتاڵە ف گیاهی است سمبل تلخی.

**کەکلێ:** کەڤ، ژەرەژ ف کبك.

**کەکـو:** ١) وشـەی دوانـدنی براگەورە؛ ٢) ناوە بۆ پیاوان ف ١) کلمهٔ خطاب به برادر بزرگ؛ ٢) اسم مردانه.

**کەکۆ:** کەکو ف نگا: کەکو.

**کەکە:** قەقە ف نگا: قەقە.

**کەکەو:** کەڤۆت ف درختی جنگلی.

**کەکێ:** کاکی کەسێ: (مستۆ **کەکێ** منە) ف برادر بزرگ کسی.

**کەگل:** قوڕی سواغدان ف کاهگل.

**کەل:** ١) چیا، کەژ، کۆ؛ ٢) بستۆ، زینۆ؛ ٣) قەڵشت، قەڵش؛ ٤) بڕەدار؛ ٥) جێگـەددانی کەوتـوو: (کابرایەکی ددان **کەل** هاتبو)؛ ٦) کار؛ ٧) بەهرە، فایدە؛ ٨) داغ، بەتین؛ ٩) بەزی شاخدار؛ ١٠) حەیوانی کەتە شاخێك‌شکاو؛ ١١) بەچەی بەز لە دەشت؛ ١٢) جۆشین: (ئاف **کەل** هاتیە)؛ ١٣) گایەك کە سواری چێل دەکرێ؛ ١٤) نێری گامێش؛ ١٥) کول، نەبڕ؛ ١٦) جۆرێ حەیوانەکێوی؛ ١٧) ئەسپاب: (**کەل و پەل**)؛

۱۸) تویژەمـار، کاژەمـار؛ ۱۹) بریقـە، درەوشین؛ ۲۰) کەچەڵ؛ ۲۱) شەپـۆلی چەم، پێلی روبار؛ ۲۲) شکستی ئەندام؛ ۲۳) شکستەبەند؛ ۲۴) نێری، تەگە ف ۱) کوه؛ ۲) گردنە؛ ۳) شکاف؛ ۴) قطعە هیزم؛ ۵) شکستگی در دندانها؛ ۶) کار؛ ۷) بهره؛ ۸) داغ؛ ۹) گوسفند شاخدار: ۱۰) حیوان یکشـاخ شکستـە؛ ۱۱) آسـایشگاه گلە در دشت؛ ۱۲) جوش؛ ۱۳) گاوگشن: ۱۴) گاومیش نر: ۱۵) کُند: ۱۶) کل کوهی: ۱۷) وسایل؛ ۱۸) پوست افتادۀ مار؛ ۱۹) درخشش؛ ۲۰) کَچل؛ ۲۱) موج رودخانە؛ ۲۲) شکستگی اندام؛ ۲۳) شکستەبند؛ ۲۴) قوچ.

**کەڵ:** ۱) بزەدار؛ ۲) نێری گامـێش؛ ۳) گای فەحـــل؛ ۴) حەیوانێکی کێوی یە، کەل؛ ۵) درشت؛ ۶) بریتی لە نازاو بەکار؛ ۷) جۆشی ئاو؛ ۸) فایدە، بەهـرە؛ ۹) زلو زەلام ف ۱) قطعـە هیزم: ۲) گاومیش نر؛ ۳) گاوگشن؛ ۴) کل کوهی؛ ۵) درشت؛ ۶) کنـایە از شجاع و کارا؛ ۷) جوش آب بر آتش؛ ۸) بهره، هوده؛ ۹) بزرگ.

**کەلا:** ۱) تیل، تیلە، مەڕمەڕ، هەڵمات؛ ۲) جگی درشت کە دە بازی دابە دەس کایەکەرەوە دەمێنێ و نادۆڕێنرێ؛ ۳) کلا، دۆرەپەرێز؛ ۴) بریتی لە هەمـەکـارە: (کاورا خۆی لێ کردوین بە **کەلا**) ف ۱) تیلە؛ ۲) قاب درشت کە دردست بازیگر می‌ماند؛ ۳) کنارەگیر؛ ۴) کنایە از همەکارە.

**کەلائەنگوچك:** ئەنگوچك، ئەنگوچکەسۆرانی ف آستین بلند پیراهن.

**کەلاپە:** ساواری نیوەکوڵاو ف بلغور نیم پختە.

**کەلات:** قەڵات ف کلات.

**کەڵاتەرزان:** ناوچەیەکە لە کوردستان ف منطقەای در کردستان.

**کەلاتی:** کەلات، قەڵات ف کلات.

**کەلاج:** درۆزن و فێڵباز ف دروغگوی حقەباز.

**کەلاجۆیە:** فریوباز، درۆهەڵبەست ف فریبکار.

**کەلاخ:** ۱) کزو زەعیف، داڵگۆشت؛ ۲) لاشەی مردگ؛ ۳) جۆرێ قالاو ف ۱) لاغر؛ ۲) جَسَد، جنازە؛ ۳) نوعی کلاغ.

**کەلاخاری:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان کە توسط بعثیان ویران شد.

**کەلار:** ۱) لەسەریەك داندراوی بڵندەوەبوُگ؛ ۲) خاپوُر؛ ۳) ناوچەیەکە لە کوردستان ف ۱) برهم انباشتە؛ ۲) ویران؛ ۳) ناحیەای درکردستان.

**کەلارە:** دەفـری لەڕیخی وشکەوەکراو بۆ پشکەڵتێکردن ف ظرفی از سرگین خشکیدە.

**کەلارێ:** خاپوُر ف ویران.

**کەلاز:** بەفـاڵ، بەکـەڵ، ماکـەرو ماین و چێڵی گانخواز ف مادە خر و مادیان و کبك گشن.

**کەلاسونگ:** قۆچەقانی، بەرەقانی ف نگا: قۆچەقانی.

**کەلاسینگ:** کەلاسونگ ف نگا: قۆچەقانی.

**کەلاش:** ۱) جەندەکی حەیوانی مردارەوەبو؛ ۲) قەڵش، قەڵاش ف ۱) لاشۀ مردار؛ ۲) شکاف.

**کەڵاش:** ۱) کەلاش؛ ۲) کڵاش، پێڵاوی لەپەڕۆ ف ۱) نگا: کەلاش؛ ۲) گیوە.

**کەلاشتن:** قەڵاشتن ف شکافتن.

**کەڵاشتن:** قەڵاشتن ف شکافتن.

**کەلاشتی:** قەڵاشتو، قەڵشاو ف شکافتە.

**کەڵاشتی:** کەلاشتی ف شکافتە.

**کەڵاشچن:** کڵاشچن ف گیوەدوز.

**کەلاشخۆر:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان کە توسط بعثیان ویران شد.

**کەڵاشە:** کڵاش ف گیوە.

**کەڵاشەکردن:** کڵاشەکردن ف نگا: کڵاشەکردن.

**کەڵاف:** کڵاف ف کلاف.

**کەڵافە:** کڵاف ف کلاف.

**کەلافەت:** قەڵافەت ف نگا: قەڵافەت.

**کەلاك:** جەندەکی مردارەوەبوُگ، کەلاش ف لاشە.

**کەلاکەل:** ۱) کوڵەکوڵی گەرمای هاوین؛ ۲) زۆرکوڵینی ئاو لەسەر ئاگر ف ۱) گرمای شدید تابستان؛ ۲) جوشیدن بسیار آب بر آتش.

**کەلال:** ۱) دەردو زەحمەت، کوێرەوەری؛ ۲) گیاگەرچەك ف ۱) رنج و مشقّت؛ ۲) گیاه کرچك.

**کەلام:** ۱) فەرموُدە، ئاخافتنی کەسی بەحورمەت: (**کەلامت وە شەکر ئەورم**)؛ ۲) قام، چڕین، کلام؛ ۳) بەسـەریەکـداکراوی گیاو کڵۆشی وردکراو ف ۱) فرمایش؛ ۲) ترانە؛ ۳) تودۀ گیاە و ساقەهای غلّۀ کوبیدە.

**کەلامێ قەدیم:** قورعان، فەرمودەی خودا ف قرآن.

**کەلامێ هۆمای:** فەماریشی خودێ ف کلام خدا.

**کەلامێ هوُمای:** فەرمودەی خودا ف کلام خدا.

**کەلان:** ۱) جوانـی تەواو، خوشـیك و دەلال؛ ۲) کوڵین ف ۱) زیبـای بی‌نقص؛ ۲) جوشیدن.

**کەڵان:** ۱) زەبەلاح؛ ۲) کوڵان، وەجۆش‌هاتن ف ۱) لندهور؛ ۲) جوش آمدن.

**کەڵانتەر:** سەرداروغە ف داروغەباشی.

**کەڵانتەری:** پۆستی داروغە ف کلانتری.

**کەلاندر:** مەڵەغان، کەلەندی، داسی درێژ کە بەدەست دەکاردەکرێ ف داس بلند.

**کەلاندن:** کوڵاندن ف جوشاندن.

**کەڵاندن:** کوڵاندن ف جوشاندن.

**کەلانگوچك:** ئەنگوچکەسۆرانی ف آستین بلند.

**کەلانە:** جۆرەنانێکی بەڕۆنە ناوەکەی سیر و پیازو... تێ دەکەن ف نوعی نان روغنی کە سبزی‌های مُعَطّر درآن ریزند.

**کەڵانە:** ۱) قوبە، دوگمەی زل، قۆپچەی درشت؛ ۲) ئازایانە ف ۱) دکمۀ درشت؛ ۲) شجاعانە.

**کەلاو:** ۱) کەلانگـوچـك؛ ۲) شێلەگە، بڕگە لە جۆگە؛ ۳) ڕژانی ئاو لە گۆل لەبەر پڕی ف ۱) آستین بلند؛ ۲) بریدگی جوی برای آبیاری؛ ۳) لبریزشدن آب استخر.

**کەلاوە:** ۱) کاول، خاپـوُر؛ ۲) چواردیواری دانەپۆشراو ف ۱) ویرانە، ویران؛ ۲) چهاردیوار بی‌سقف.

**کەلایانێ:** تیلەبازی، هەڵماتێن، مەڕمەڕێن ف تیله‌بازی.

**کەلایی:** ۱)خوارایی، خواری؛ ۲) نێوان‌تێ‌کەوتنی دیوار یا ددان ف ۱) کجی؛ ۲) شکاف افتادگی در دیوار یا صف دندان.

**کەلایێن:** کەلایانێ ف تیله‌بازی.

**کەڵب:** ۱) کلب؛ ۲) کلۆی زۆر پچوُك: (**کەڵبە** قەندێکم دەیە چای پێ وەخۆم) ف ۱) دندان پیشین جانور؛ ۲) کلوخک.

**کەلبـــایە:** ۱) بێ‌فەڕی؛ ۲) بێ‌شەرمی؛ ۳) تەنبـەڵی‌و تەوەزەلی ف ۱) بداخلاقی؛ ۲) بی‌شرمی؛ ۳) تنبلی.

**کەلبوت:** کەلبایە ف نگا: کەلبایە.

**کەلبورێ:** ڕژانی تراو لەدەفر بەهۆی کولانی بەتەوژم ف سر رفتن مایع روی آتش.

**کەڵبـە:** ۱) کلب؛ ۲) کەڵبـەبـەرد؛ ۳) هەنجیری کاڵ ف ۱) دندانهای پیشین؛ ۲) سنگ برجسته؛ ۳) انجیر نارس.

**کەلبـــەتـان:** ۱) ماشـەی پەنگـرگر؛ ۲) گازی مێخ‌کێشـانـەوە ف ۱) آتش‌چین؛ ۲) گازانبر میخ‌کشی.

**کەڵپ:** ۱) کەڵبـە، کلۆی پچـوُك؛ ۲) ددانی پێشینی سەگ‌و دڕندە؛ ۳) گمـاڵ، کسـوُك ف ۱) نگـا: کەڵبـە، کلوخک؛ ۲) دندانهای پیشین جانوران درنده؛ ۳) سگ.

**کەلپاچا:** فرەخۆر، تێرنەخۆر ف پرخور.

**کەلپاچە:** ۱) کەللەپاچە؛ ۲) زۆرخۆر ف ۱) کلّه‌پاچه؛ ۲) پرخور.

**کەلپزا:** بێ‌ئابڕو، شەرم‌تکاو ف بی‌شرم.

**کەلپزە:** کەلپزا ف بی‌شرم.

**کەڵپك:** ۱) تێکوڵی دەنکی کڕەکراو؛ ۲) کرپك، کەپەك؛ ۳) قرتماخەی برین ف ۱) پوست دانه‌های آشی؛ ۲) نخاله؛ ۳) خشك ریشه.

**کەڵپـوُس:** ۱) پێستـەی بەتیسکەوە کە لەسەری دادەنیشن؛ ۲) عەبای تیسکن لە پێستەپەز ف ۱) پوستین گستردنی؛ ۲) پوستین پوشیدنی.

**کەڵپـــە:** ۱) کەڵپ؛ ۲) بڵنـــدایی بەردین لە کێودا، دەمــاغـــە: (لـەو **کەڵپە**شاخە دیتمەوە) ف ۱) نگا: کەڵپ؛ ۲) برآمدگی سنگی درکوه، دماغه.

**کەڵپەتڕە:** قسەی هیچ‌و پوُچ ف یاوه.

**کەلپەزی:** خمخموُك، خەمەگرۆ ف بزمچه.

**کەلپەل:** ۱) جلك؛ ۲) شڕەو بڕەی ناو ماڵ، خرت‌و پرت ف ۱) لباس؛ ۲) خرت و پرت.

**کەلپەی:** سەگایەتی، کاری سەگانە ف شیطنت.

**کەلپی:** دێڵەسگ، سەگی‌مێچکە ف ماده‌سگ.

**کەلتە:** کلتە، کلتور ف سرمه‌دان.

**کەڵتـە:** ۱) نوێ‌کردنەوە بە چاکردنەوە: (خۆم **کەڵتە** کردەوە)؛ ۲) ژنی سەڵیتەو زمان‌درێژ ف ۱) نوسازی و تعمیر؛ ۲) سلیطه.

**کەلتەگە:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**کەلج:** کلچێوك، کلج ف میل سرمه‌کشی.

**کەلخانە:** دوکانی شیرگەرو تفەنگ‌ساز ف مغازهٔ اسلحه‌فروشی.

**کەلخوَت:** کوَلوس، ددان‌کەوتو ف بی‌دندان.

**کەلدان:** ۱) شکستەبەندی؛ ۲) پەڕینی گا لە چێڵ ف ۱) شکسته‌بندی استخوان؛ ۲) پریدن گاونر بر مادهٔ گشن‌خواه.

**کەڵدان:** چێڵ لەکەڵ کێشان ف گشن دادن گاو.

**کەلدایا:** کوڵەکوڵ، کەلاکەل ف عنفوان، گرماگرم.

**کەلدایێ:** کەلدایا ف عنفوان.

**کەڵدڕ:** گیایەکە ف علفی است.

**کەلدوَش:** جۆرێ کولێرە کە لەبن ژیلەمۆ دەبرژێ ف نوعی نان گرده.

**کەلدومان:** هەڵم، بوَق ف بُخار.

**کەلدوەش:** کەلدوَش ف نوعی نان گرده.

**کەلژ:** قەدەم، تینێ کە لە گەرمای زۆر دێتەبەرچاو ف الو از گرمای شدید.

**کەلژە:** سابرێن، نێری، کەلێژە، تەگە ف بُز نر تکه.

**کەلژین:** قەدەم‌کردن، دیاری‌دانی قەدەم ف اَلو کردن گرما.

**کەلستن:** کوڵین، کەلین، جوَش‌هاوردن ف جوشیدن.

**کەلش:** قەڵش ف شکاف.

**کەلشت:** قەڵشت ف شکاف.

**کەلشتوَك:** ۱) هەنارو هەنجیری بەدارەوەقەڵشاو؛ ۲) دانەوێڵەی نەکوڵاو ف ۱) انار و انجیر شکافته بردرخت؛ ۲) دانهٔ نیم‌پز.

**کەلشین:** قەڵشین ف شکافته‌شدن.

**کەلفس:** کوَلوَس ف کسی که دندان پیشین ندارد.

**کەلفیچ:** کەلفس، کوَلوَس ف نگا: کوَلوَس.

**کەلك:** ۱) فایدە، بەهرە: (**کەلکی** نەماوە، بێ‌**کەلکە**)؛ ۲) نانی بەڕوو ف ۱) بهره؛ ۲) نان بلوط.

**کەڵـــك:** ۱) بارە، فایدە؛ ۲) سوانـە، پاسـارە؛ ۳) باڵـدارێکی زەلامی ماسـی‌خۆرە. قورتمێکی *لە خوار دنـــدوُکی هەیە ماسی‌و ئاوی تێدا عەنبار دەکا*؛ ۴) سەربان؛ ۵) باڵدارێکی سپیە بەقەد کوَتر؛ ۶) ئاتاجی ف ۱) بهره؛ ۲) برامدگی لب بام؛ ۳) مرغ سقّا، پلیکان؛ ۴) پشت‌بام؛ ۵) پرنده‌ای سپیدرنگ کبوترسان؛ ۶) احتیاج.

**کەڵك‌تێ کەوتن:** ئاتاج‌بەکەسێ بوُن ف محتاج به کسی شدن.

**کەلك‌دان:** بەهرەدان ف بهره‌دادن.

**کەڵك‌دان:** بەهرەدان ف بهره‌دادن.

**کەلـك‌دانەوە:** بەهرەگەیاندنی کڕدراو: (ماڵەکە **کەلکی نەدایەوە**) ف بهره‌وری مال خریداری شده.

**کەڵك‌دانەوە:** کەلك‌دانەوە ف بهره‌وری مال خریداری شده.

**کەل کردن:** ۱) لالێ کردنەوە، هێندێ لە شتێ بڕین؛ ۲) نێوان‌تێ‌خستنی دیوارو ددان‌و... ف ۱) بریدن از چیزی؛ ۲) شکاف انداختن در لبهٔ چیزی.

**کەلکەل:** ۱) کوڵەکوڵ؛ ۲) خولیا، ئارەزوی زۆر بە خەیاڵ ف ۱) شدّت گرما؛ ۲) هوس و آرزو.

**کەلکەلە:** خولیا، خەیاڵ ف آرزو.

**کەڵکیت:** کەرکیت [ف] دفته، شانهٔ پودکوبی.
**کەڵ گامێش:** نێرەی جسنی گامێش [ف] گاومیش نر.
**کەڵگرتن:** ئاوس بوُنی چێڵ لە کەڵەگا [ف] آبستن شدن گاو از گشن.
**کەلگری:** بەکوڵ گریان [ف] باشدت گریستن.
**کەلگە:** شێلەگەی جۆگە [ف] جای بریدگی جوی آبیاری.
**کەللا:** ١) کەلاجگ؛ ٢) تیلە، مەڕمەڕ [ف] ١) قاپ درشت؛ ٢) تیلە.
**کەللارە:** کەلارە، دەفری ڕیخ بۆ پشکەڵ گوێزانەوە [ف] نگا: کەلارە.
**کەللە:** ١) لەئـەستـۆ بەرەژوُر؛ ٢) داری چەمێنراو بۆ دەوری شت؛ ٣) دەورەی ئارەخچن؛ ۴) وردی بەتوندی پێکەوەنراو، تۆڵا [ف] ١) کلّهٔ سر؛ ٢) چنبرهٔ چوبین؛ ٣) قسمت جانبی عرقچین؛ ۴) ریز به هم چسبیدهٔ کلوخ شده.
**کەللەئاهەك:** قسڵی یەك گرتوی بەکڵۆ [ف] آهك کلوخ شده.
**کەللەبا:** ١) بنیادەمی سەرسەخت؛ ٢) بنیادەمی بەفیز [ف] ١) آدم لجوج؛ ٢) آدم خودنما.
**کەللەبۆش:** بێ ئاوەز [ف] تهی مغز.
**کەللەبێژنگ:** داری دەوری بێژنگ [ف] چنبرهٔ غربال.
**کەللەپـا:** ١) شەکەتی لەتاقەت کەوتو؛ ٢) لەت و کوت [ف] ١) خستهٔ از کارافتاده؛ ٢) لت وپار.
**کەللەپاچە:** چێشتی سەروپێ [ف] کلّەپاچە.
**کەللەتـەزێن:** برێتی لە خواردن و خواردنـەوەی زۆر سارد [ف] کنـایە از خوردنی و آشامیدنی بسیار سرد.
**کەللەچاخ:** سەرزل [ف] کلّەگندە.
**کەللەدۆش:** چێشتی لە برنج و گوێز و چۆنەر و کشمیش [ف] آشی است.
**کەللەڕەق:** سەرسەخت [ف] لجباز.
**کەللەزاور:** ترسەنۆك [ف] بزدل.
**کەللەشەق:** کەللەڕەق [ف] لجباز.
**کەللەشەکر:** شیلەشەکری دەقاڵب کراوی وشکەوەبوُگی قوُچ دەرهاتگ [ف] کلّەقند.
**کەللەقەند:** کەللەشەکر [ف] کلّەقند.
**کەللەکۆن:** کۆنەپەرست [ف] مرتجع.
**کەللەگەرم:** برێتی لەمرۆی توُڕە و تۆسن [ف] کنایە از آدم عصبانی.
**کەلـلەیی:** ١) بنیادەمی کەمهۆش و گوێ نەدەر بەهیچ؛ ٢) شێت و وێت؛ ٣) ژوُری ڕوُبەهەیوان؛ ۴) دەنگی زۆرتیژ و بڵندی خۆش [ف] ١) لاقید؛ ٢) خُل؛ ٣) اتاق روبەتراس؛ ۴) صدای بلند و رسا.
**کەل لێ کەوتن:** کەڵك تێ کەوتن [ف] محتاج به کسی شدن.
**کەلم:** ١) کەلپ، ددانی پێشـەوەی دڕندە؛ ٢) کرم [ف] ١) دندان پیشین درّنده؛ ٢) کرم.
**کەلما:** کونی ورچ و پڵنگ [ف] کنام خرس و پلنگ.
**کەلمتە:** گڵمەت، کەستەك، سندەگڵ [ف] کلوخ.
**کەلمە:** کەڵەوە، چەنبەرەی ملی گاجوُت [ف] یوغ گردن گاو شخم‌زنی.
**کەلمەل:** کەل‌پەل [ف] خِرت و پِرت.
**کەلمیز:** مێزەل، کەسێ کە مێزی بۆ ڕاناگیرێ [ف] شاشو.

**کەلمێش:** پێشکەی دندوك‌درێژ، تەپۆ [ف] پشهٔ مالاریا.
**کەلناس:** ١) قەڵایی، کانزای سپی کردنەوەی پاقر؛ ٢) جیقنەمەل [ف] ١) قلع؛ ٢) چینەدان.
**کەلنایا:** ١) کوڵەکوڵ؛ ٢) لەگەرمان سوُر هەڵگەڕاو [ف] ١) شدت و اوج، عنفوان؛ ٢) سرخ شده از گرما.
**کەلـو:** ١) کلوی کوڵکـەو پەمۆ؛ ٢) بەری گیا کە چەند دەنکی بەرێزی تێدایە: (**کەلوی** ماش، **کەلوی نۆك**)؛ ٣) پۆڵکە؛ ۴) برجی عاسمان؛ ۵) ئاڵقەی چنینی لە بەن: (جۆرابەکەت **کەلوچنە**)؛ ۶) بڕوار، قەدی چیا؛ ٧) ریش سپی و بەڕێز لە ئاوایی دا [ف] ١) باغند؛ ٢) نیامك گیاە؛ ٣) دانەایست شبیه نخودفرنگی؛ ۴) برج آسمان؛ ۵) حلقهٔ بافتنی نخی؛ ۶) کمرکوه؛ ٧) ریش سپید محترم در آبادی.
**کەڵو:** ناوی چەمێکە لە کوردستان [ف] نام رودی در کردستان.
**کەلواز:** سەرمای سەخت [ف] سرمای شدید.
**کەڵواڵ:** گیایەکە بنەکەی دەخورێ [ف] گیاهی است با پیازهٔ خوردنی.
**کەلواڵك:** کەڵواڵ [ف] نگا: کەڵواڵ.
**کەڵوان:** بەرێکی دارمازوە بۆ دەباغ دەبێ [ف] ثمری از درخت مازوج.
**کەلوبنار:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد [ف] نام روستایی در کردستان کە توسط بعثیان ویران شد.
**کەلوپا:** سەروپێ [ف] کلّەپاچە.
**کەلوپاچکە:** کەلوپا [ف] کلّەپاچە.
**کەلوپوُڕ:** ١) شڕەو بڕە، خرت و پرت؛ ٢) جێ‌ماو لە مردگ [ف] ١) خرت و پرت؛ ٢) ارث، ماتَرَك.
**کەل و پەل:** ١) ئەسپاباتی‌ماڵ؛ ٢) جلك؛ ٣) شڕەوبڕە [ف] ١) اثاثیە؛ ٢) لباس؛ ٣) خرت وپرت.
**کەلۆت:** کرۆژ [ف] کلوچ.
**کەڵۆت:** کڵۆت [ف] کفل ستور.
**کەلۆتن:** کرۆتن، کرۆژتن [ف] کلوچیدن.
**کەلۆتە:** کەڵپك [ف] نگا: کەڵپك.
**کەلوچا:** جۆرێ ماسی ڕەنگاورەنگ [ف] نوعی ماهی رنگارنگ.
**کەڵ ۆڕ:** ١) بەشێ لە چواربەشی کورد؛ ٢) دوگوندی کوردستان بەم ناوە بەعسی کاولی کردوە [ف] ١) تیرەای انبوە از کرد، کَلْهُر؛ ٢) دو روستا بە این اسم در کردستان توسط بعثیان ویران شدە است.
**کەڵ ۆڕی:** قامێکی بەناوبانگە [ف] آهنگی است مشهور.
**کەلـوز:** ١) بەرێکی گزمـوُلـەیە ڕەنگی تێکـوڵی سوُری ئامـاڵ ڕەشـەو کاکڵەکەی دەخورێ، فنق؛ ٢) بەری داری سنەوبەر [ف] ١) فندق؛ ٢) میوهٔ درخت صنوبر.
**کەلۆژتن:** کرۆشتن [ف] کلوچیدن.
**کەلۆس:** کوڵۆس [ف] نگا: کوڵۆس.
**کەڵۆس:** کوڵۆس [ف] نگا: کوڵۆس.
**کەلـوش:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد [ف] نام روستایی در کردستان کە توسط بعثیان ویران شد.
**کەلـوشە:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد [ف] نام روستایی در

کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**کەلـۆك:** ۱) کڵۆك؛ ۲) نێریەکێوی دوساڵە ف ۱) دانۀ زودپز؛ ۲) شاك کوهی دوساله.

**کەلوك:** ۱) نیو چارەگەخشت؛ ۲) جۆرێ ماسی ف ۱) یك هشتم آجر؛ ۲) ماهی سلمون.

**کەلوکۆم:** خێچ و خوار، چەفت و چەوێڵ ف کج و کوله.

**کەلۆکە:** پارچە خشت یا ئاجۆری چکۆڵە بۆ ناوئاخن ف قطعۀ کوچكِ خشت یا آجر در کار بنّایی.

**کەلۆکێ:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**کەلوُل:** ئاژەڵی توێڵ سپی. قەش. قەشان ف دام پیشانی سفید.

**کەلوُم:** پەیف، قسە ف کلام.

**کەلوُم‌هوُمای:** فەرمایشی خودا ف کلام خدا.

**کەلوُم‌هۆمای:** گفتی خوا ف کلام خدا.

**کەلومەل:** کەل‌پەل، کەلوپەل ف خِرت و پِرت.

**کەڵوە:** ۱) کەڵپە، ددانی پێشین؛ ۲) قەڵپوُزی زین؛ ۳) کڵۆی چکۆڵە ف ۱) دندان پیشین؛ ۲) قربوس؛ ۳) کلوخك.

**کەڵوەران:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**کەلوەسمە:** کرمی نۆکی سەوز ف کرم نخود.

**کەلـوُیش:** ۱) گۆشتی چەقـاڵتـە؛ ۲) گۆشتی لەڕی خراپ ف ۱) گوشت‌رگ‌آلود؛ ۲) گوشتِ حیوان لاغر.

**کەلە:** ۱) داری داهێنراو بۆ دەوری بێژنگ‌و...، کەللە؛ ۲) فرۆی ناو قامیش؛ ۳) داری دەوری پەڕەی خەڕەك؛ ۴) قەڵا؛ ۵) پاشگری بە مانا ئامالّ: (منالّێکی سورکەلەیە) ف ۱) چنبرۀ چوبین؛ ۲) آغوزی که در کاوك نی به عمل آید؛ ۳) پرۀ چرخ دوك‌ریسی؛ ۴) قلعه؛ ۵) پسوند به معنی مانند.

**کەڵە:** ۱) زەلام؛ ۲) درشت؛ ۳) جۆرێ برنج؛ ۴) بەڵایەکە لە ڕەگی توتن‌و بێستان دێتە دەرو وشکی دەکات؛ ۵) لەسەریەك‌دانراوی بەرزەوەبوُگ؛ ۶) خۆگرتن لە قسـەی خەڵـك، کوڵە؛ ۷) وشەی دنەدانی گا بۆ سەر چێڵ؛ ۸) برێتی لە پیاوی ئازاو بە حورمەت ف ۱) بزرگ؛ ۲) درشت؛ ۳) نوعی برنـج؛ ۴) انگل گیاه توتون و پالیز؛ ۵) برهم انباشته؛ ۶) پنهان شدن برای استراق سمع؛ ۷) کلمه‌ای برای تحریك گاو گشن؛ ۸) کنایه از آدم شجاع و مُحترم.

**کەڵهـ:** کەم‌وێنە، بێ‌وێنە ف بی نظیر.

**کەلهاتن:** ۱) بەکارهاتن، فایدەدان؛ ۲) جۆش‌هاتن ف ۱) به کارآمدن؛ ۲) جوش آمدن.

**کەڵهاتن:** نێرخواستنی چێڵ ف گشن خواهی گاو ماده.

**کەڵەئەموست:** قامکەگەورە ف انگشت شست.

**کەڵەئەنگوست:** کەڵەئەموست ف انگشت شست.

**کەلەباب:** کەڵەشێر، دیقل ف خروس.

**کەڵەباب:** کەرەباب، کەرەشێر، دیکل، دیقل ف خروس.

**کەڵـەبابە:** ۱) وێنەی دیقل لە کانزا یان لە بەن‌و هەرچی بۆ جوانی؛ ۲) ئێسکی زەقی قورقـوڕوچکـەی پیاوان ف ۱) مجسّمـۀ کوچك زینتی خروس؛ ۲) سیبك حنجرۀ مردان.

**کەلەباش:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**کەلەبدون:** نەقش لە دیوارو چوارچێوە بۆ جوانی ف دکور.

**کەلەبڕ:** پارچەزەوی تایبەتی بە کەسێ بەخشرابێ ف قطعه‌زمین تیول.

**کەلـەبـەدری:** گونـدێکـە لە کوردستـان بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدۀ کردستان توسط بعثیان.

**کەلەبەر:** ۱) قەڵش لە دیواردا؛ ۲) قەڵش لە شاخی بەردین‌دا؛ ۳) برێتی لە دەرەتـانی تەنگ ف ۱) شکاف دیوار؛ ۲) شکاف کوه سنگی؛ ۳) کنایه از راه نجات دشوار.

**کەلەبێژنگ:** کەللەبێژنگ ف چنبرۀ چوبین غربال.

**کەلەپاچە:** ۱) سەروپێ؛ ۲) لەت‌و کوت ف ۱) کلّەپاچە؛ ۲) لت و پار.

**کەلەپاچە کردن:** لەت‌وکوت‌کردنی مرۆ: (بەخەنجەر کەلەپاچەی کرد) ف لت وپارکردن.

**کەلەپچە:** دەستبەندی ئاسنی تاوانباران ف دستبند زندانی.

**کەڵەپشکۆ:** پەنگری زل، سکڵی درشت ف اخگر درشت.

**کەلەپوُر:** ۱) جێ‌ماگ لە مردگ؛ ۲) کەل‌و پەلی ناو ماڵ؛ ۳) پیتاك؛ ۴) شابـاشی زەماوەند ف ۱) ارث؛ ۲) خرت و پرت اثاثیه؛ ۳) باج؛ ۴) پولی که درعروسی به مُطرب می‌دهند.

**کەڵەپیاو:** پیاوی ئازاو بەڕێزو جوامێر ف بزرگمرد.

**کەڵەپیتاك:** باجی بە زۆرو ناهەقی ف باج زورکی.

**کەلەتۆر:** کرێژی سەر ف شورۀ سر.

**کەلەخ:** ۱) لەشی بنیادەم؛ ۲) کەلاك ف ۱) کالبد آدمی؛ ۲) لاشۀ مردار.

**کەڵەدار:** بڕەدار ف قطعه هیزم.

**کەلـەرم:** گیایەکی چاندنی گەڵاپانە بەتۆپ دەردەچێ‌و پەلکی دەکرێتە دۆڵمە پەلکی زۆر سپی‌و تورتە، کەلەم ف کلم.

**کەڵەرە:** پێل‌شکێن، شەپۆل‌ڕەوێن ف موج شکن.

**کەلەڕەش:** قالاو، قەلەڕەشە ف کلاغ.

**کەڵەز:** جەنگەی تێ‌بەربوُنی بەران‌و نێریەکێوی ف موسم جفت‌گیری بز و گوسفند کوهی.

**کەلەزرك:** چینەدانی‌مەل، جیقڵدان ف چینه‌دان.

**کەلەزە:** سابرێن، تەگە، نێری ف قوچ.

**کەڵەزەڕی:** کاری بەزۆرو ناچاری ف کار زورکی.

**کەڵەژ:** قایمەمێو، داربەستی داری ڕەز ف چوب‌بست تاك.

**کەڵەژن:** کەیوانوی زۆر بەڕێزو ژێهاتی ف کدبانوی بسیار محترم.

**کەڵـەس:** ۱) پەتی درێژ کە بەسـەر چەما ڕاکێشراوە پێی دەپەڕنەوە؛ ۲) چەپەرێ کە خراوەتە سەر کوندەی فوکراو بۆ پەڕینەوە، کەڵەك ف ۱) ریسمان عبور از رودخانه؛ ۲) کلك عبور از آب.

**کەلەستون:** کۆلکەزێڕینە ف رنگین کمان.

**کەلـەستە:** ۱) کەرەستە، ئامراز؛ ۲) قەوارەی لەشی مرۆ، کەلەخ ف ۱)

ابزار؛ ٢) کالبد آدمی.

**کەلەسمە:** کرمی بەڵای نۆك ف کرم آفت نخود.

**کەڵـــەســو:** چیڵێ کە لەبـەر زۆرلێ‌پەڕینی جوانـەگایان جاڕز بوە ف مادەگاوی کە از جفت‌گیری زیاد بە ستوە آمدە.

**کەلەسونگ:** قەڵماسك، کەهنیك ف فلاخن.

**کەڵـــەش:** ١) کەلـــەخ؛ ٢) جوان‌و نازدار؛ ٣) کەچـەڵ؛ ٤) شەلاتی، قەلاش؛ ٥) چابـك، مەزبوت ف ١) نگا: کەلەخ؛ ٢) زیباوشنگ؛ ٣) کچل؛ ٤) نگا: شەلاتی؛ ٥) چالاك.

**کەڵەش:** قەلاش، شەلاتی ف شارلاتان، هرزە ولگرد.

**کەڵـەشـاخ:** باکێشی خوێن‌گرتن لە لەش، ئامـرازی حەجـامـات ف بادکش حجامت.

**کەلـەشخـان:** لەو گونـدانـەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان کە بعثیان آن را ویران کردند.

**کەلەشقان:** شوانی زۆر کارامە ف چوپان کارآمد و ماهر.

**کەلەشە:** ڕێگر، چەتەی‌تالاّنکەر ف راهزن.

**کەلەشەکر:** کەللەشەکر ف کلەقند.

**کەلەشەی:** ڕێگر، چەتە ف راهزن.

**کەڵەشێر:** دیکل، کەڵەباب ف خروس.

**کەلەشێرە:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان کە توسط بعثیان ویران شد.

**کەڵەشێرە:** کەڵەبابە، وێنەی کەڵەباب ف مجسّمۀ زینتی خروس.

**کەڵەشینکە:** بەرێکی دارمازو ف از محصولات درخت مازو.

**کەلەف:** کەلاف ف کلاف.

**کەلەفیچ:** ددان کەل ف دندان شکستە.

**کەلەقەند:** کەللەقەند ف کلەقند.

**کەلەك:** ١) قولاّخە، پینەی لێواری قۆندرە؛ ٢) کوڵەك؛ ٣) ڕۆچنە ف ١) پینە بر حاشیۀ کفش؛ ٢) دانۀ زودپز؛ ٣) روزنە.

**کەڵـەك:** ١) کۆمـابـەردی بەسەریەکادراو؛ ٢) دیواری ئیشکەبەرد؛ ٣) کەلـەس، چەپـەری سەر کونـدە بۆ پەڕینـەوە؛ ٤) تەڵەکە، حیلە؛ ٥) سوانە، پاسارە؛ ٦) لەسەریەك دانراو ف ١) تودە سنگ؛ ٢) سنگچین؛ ٣) کلك عبور از آب؛ ٤) نیرنگ؛ ٥) لبۀ بام؛ ٦) برهم انباشتە.

**کەڵەکان:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان کە توسط بعثیان ویران شد.

**کەڵەکاوێ:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان کە توسط بعثیان ویران شد.

**کەڵەكباز:** حیلەباز، فێڵاوی ف حقەباز.

**کەڵەكبون:** لەسەریەك جێگیر بونی زۆر شت ف برهم انباشتە شدن.

**کەڵەکچی:** کەڵەکی سەرئاو ناژۆ ف کلك‌ران.

**کەڵـەکـردن:** ١) لەسـەریەك دانانی زۆر شت؛ ٢) خۆگرتن بۆ قسەی خەڵك ف ١) برهم انباشتن؛ ٢) استراق سمع کردن.

**کەڵـەك کردن:** ١) لەسـەریەك دانـان؛ ٢) کۆبونەوەی چەند کەسێ لە دەوری یەك؛ ٣) حیلەکـردن؛ ٤) گیرکردنی پوکە لە لوولەی تفەنگ یا دەمـــانچـەدا ف ١) برهم انبـاشتن؛ ٢) گردهم آمـدن؛ ٣) نیرنـگ بەکاربردن؛ ٤) گیرکردن پوکە در لولۀ تفنگ یا تپانچە.

**کەڵەكلێدان:** فێڵ کردن ف حقّەزدن.

**کەڵەکن:** گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدۀ کردستان توسط بعثیان.

**کەلەکوتك:** کاسەی دارینی کەچ‌و کروچ ف کاسۀ چوبین لبەشکستە.

**کەلەکۆتك:** کاسەی دارینی زەلام، سوێنەی دارین ف تشتك چوبین.

**کەلەکوچ:** شەپیلك، ئێسکی پانی شان ف استخوان پهن شانە.

**کەڵەکۆك:** کەڵەشێر، دیکل، کەڵەباب ف خروس.

**کەڵەکۆکە:** ناوی دێ‌یەکە لە کوردستان ف نام دهی درکردستان.

**کەلەکە:** ١) خاڵیگە، برك؛ ٢) کاسەی کەل، کاسەی دارینی لێوخوراو؛ ٣) دەفری سواڵەتی گوڵ‌و ڕێحان تێداچاندن ف ١) تهیگاە؛ ٢) کاسۀ چوبین وارفتە؛ ٣) گلدان سفالی.

**کەڵـەکە:** ١) کۆبونەوەی خەڵك لەسەر شتێك: (**کەڵەکە مەکەن**)؛ ٢) فێڵ‌و تەڵەکە ف ١) گردهم‌آیی شلوغ، تراکم جمعیّت؛ ٢) حیلە.

**کەڵەکەبڕێن:** خۆ بەسەریەکدا دان‌و پاڵ‌پێوەنان ف تراکم و فشار جمعیّت.

**کەڵـەکـەتڕە:** ١) بڕێتی لە لەسەریەك کەڵەکەکراوی لەڕمان‌نزیك؛ ٢) بڕێتی لە کارێ کە ناشێ سەر بگـرێ ف ١) کنـایە از برهم انبـاشتۀ سست بنیان؛ ٢) کنایە از کاری کە کردنی نیست.

**کەڵەکەترێ:** خۆ بەسەریەکدادانی مرۆڤان بۆ بازی‌و شۆخی ف خود را بر همدیگر انداختن بە قصد شوخی.

**کەلەکەل:** کوڵەکوڵی گەرماو ئاوی سەرئاگر ف جوشیدن.

**کەڵـەکـەڵـە:** ١) پیاوانی گەورە؛ ٢) وتـەی دنەدانی جوانەگا بۆ سەر مانگابەکەڵ ف ١) بزرگ مردان؛ ٢) کلمۀ تحریك گشن بر مادە گاو.

**کەڵەکەوان:** کەڵەکچی ف کلك‌ران.

**کەڵەکین:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان کە توسط بعثیان ویران شد.

**کەڵـــەکێوی:** ١) جۆرێ حەیوانـــەکێوی؛ ٢) نێرەکێوی ف ١) کل کوهی؛ ٢) شاك کوهی.

**کەڵەگا:** ١) گایەك کە سواری چێڵ دەبێ بۆ ئاوس‌کردنی؛ ٢) بڕێتی لە مرۆی زۆری‌کەر ف ١) گاوگشن؛ ٢) کنایە از زورگو.

**کەڵەگایی:** زۆری، ناهەقی ف زورگویی.

**کەڵەگری:** گریانی بەکوڵ ف باشدّت گریستن.

**کەڵەگەت:** قەدبڵند ف بلندبالا.

**کەڵەگەرم:** ١) جەنگەی گەرمای زۆر؛ ٢) بڕێتی لە چلەی هاوێن ف ١) عنفوان گرما؛ ٢) کنایە از چلّۀ تابستان.

**کەلەگەور:** کۆللارە، باڵدارێکی ڕاوکەرە ف از پرندگان شکارچی.

**کەلەگی:** ئۆدەی ڕۆ بە بەربێلایی، کەللەیی ف اتاق روبە تراس.

**کەلەلا:** ١) شەکەت؛ ٢) نەخۆشی زۆر نەخۆش؛ ٣) پەرێشان‌حاڵ؛ ٤) ڕەق‌و کز ف ١) خستە؛ ٢) بیمار بدحال؛ ٣) پریشان حال؛ ٤) لاغر مردنی.

**کەڵەلان:** تەوڵە، تەویلە، پشتێر ف اصطبل.

**کەلەم:** ۱) کەلەرم؛ ۲) دڕك، چقڵ؛ ۳) داری نوكدادراو؛ ۴) تیشەشاخی باریك ف ۱) کلم؛ ۲) خار؛ ۳) چوب نوك تراشیدە؛ ۴) کوە سنگی نوك تیز.

**کەڵەم:** ئاڵقەداری ملی گا ف چنبرگردن گاو.

**کەلەمان:** قارەمان، پیاوی هەرەئازا ف قهرمان.

**کەلەمایش:** زوان کرانەوە بۆ قسیەکوتن ف بە سخن آغاز کردن.

**کەڵەمباز:** قەڵەمباز، بازی بڵندو هەراو ف پرش بُلند.

**کەڵەمبان:** هەمبانەی گەورە ف انبان بزرگ.

**کەلەمپەر:** چێشتی کەنگری وشکەوەکریاك ف آش کنگر خشك شدە.

**کەلەمچە:** کەلەپچەی دەستی تاوانبار ف دستبند زندانی.

**کەڵەمڕ:** تۆکەبەر، بەر، موی بەرگەدە ف موی زهار.

**کەڵەمو:** ۱) نەخۆشیو ژانێکە لە ئەنگوست پەیدا دەبێ نێرتکی لە موی ئەستوُر دەکا؛ ۲) موی درشت؛ ۳) خڕکردنەوەی خوریو موی دەناوئاغەڵ ڕژاو: (**کەڵەمو دەکا**) ف ۱) کژدمە، نوعی بیماری؛ ۲) موی درشت؛ ۳) گردآوری پشم و موی ریختە در آغل.

**کەڵەموست:** قامکەزلە ف انگشت شست.

**کەلەموك:** جۆرێ کەلەمی وەك تۆر، داش کەلەم ف کَلَم قمری.

**کەڵەمە:** ۱) کەڵەم؛ ۲) قەڵەمەی چاندن؛ ۳) تەنگوچەڵەمە ف ۱) چنبر گردن گاو؛ ۲) قلمە؛ ۳) مُصیبت.

**کەلەمەك:** ۱) زۆروزوڵم؛ ۲) کەڵەوەی ملی گا ف ۱) ظلم و زور؛ ۲) یوغ گردن گاو.

**کەڵەمە کردن:** رام کردنیڕەوەك ف رام کردن رموك.

**کەلەمی:** گیایەکە گەڵاکەی بەوشکی لە توتن ئەکا ف گیاهی است.

**کەڵەمێر:** کەڵەپیاو ف شجاع، رادمرد.

**کەڵەمێرو:** مێروی سوُری درشت، مێرولەعەجەمانە ف مورچۀ درشت.

**کەڵەمێش:** کەڵمێش ف پشۀ مالاریا.

**کەلەن:** ۱) قەلەن، شیربایی؛ ۲) قەلادەی ملی تاژی ف ۱) شیر بها؛ ۲) قلادۀ سگ شکاری.

**کەڵەن:** کەڵەم ف چنبرۀ گردن گاو.

**کەڵەنج:** جۆرێ بەری دارمازو ف نوعی ثمر مازوج.

**کەلەندر:** کەلاندر، مەڵەغان ف داس دستەبُلند.

**کەلەندی:** داسی درێژی دەسکدار، مەڵەغان ف داس بلند دستەدار.

**کەلەندین:** بەفری بەسەریەکدا کەڵەکەبوُگ ف تودە برف برهم انباشتە.

**کەلەنگ:** کەنگر، قنگر ف کنگر.

**کەلەواژی:** قسەی بێشەرمانە ف سُخن وقیح.

**کەڵەوان:** شوانی کەڵگامێشان ف چوپان گاومیشهای نر.

**کەڵەوانە:** ۱) کەڵەم؛ ۲) قوبە، قوپچەی زل ف ۱) چنبرۀ گردن گاو؛ ۲) دگمۀ درشت گنبدی.

**کەلهو:** دەبەنگ، کەمفام، گەلحۆ ف نفهم، احمق.

**کەڵهوڕ:** کەڵوڕ ف نگا: کەڵوڕ.

**کەلهۆشك:** دروشم، داغی نیشانە بەماڵاتەوە ف داغِ نشانۀ دام.

**کەلهۆك:** ۱) قەلایچە، قەلای پچوُك؛ ۲) لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف ۱) قلعۀ کوچك؛ ۲) روستایی درکردستان کە بعثیان آن را ویران کردند.

**کەڵەوە:** کەڵەم، ئاڵقەی دارینی ملی گاو گاگێرە ف چنبرۀ گردن گاو.

**کەلەوەر:** کەلەبەر ف نگا: کەلەبەر.

**کەڵەوەکێشی:** سەرسەختی، بەقسەنەکردن ف نافرمانی، سرکشی.

**کەڵەوێ:** گیایەکی دڕکاوییە ف گیاهی است خاردار.

**کەلەهـ:** قەلا، کەلە ف قلعە.

**کەڵەهەرز:** کەڵەز ف نگا: کەڵەز.

**کەڵ هەیدان:** جۆرێ شوربا ف نوعی آش.

**کەڵەهێڕ:** ۱) کۆبوُنەوەی جوانەگای زۆر لەسەر مانگابەکەڵ؛ ۲) بریتی لە کۆبوُنەوەی زۆرکەسی لە دژی تاکەکەسێك ف ۱) ازدحام گاوهای نر بر مادە گاو؛ ۲) کنایە از ازدحام عدّەای بر علیە کسی.

**کەلەی:** کرێژی سەر ف شورۀ سر.

**کەلی:** ۱) بێخوێ؛ ۲) نێوان تێ کەوتوُیی دیوار ردان؛ ۳) کللك قوڵە؛ ۴) گوێ کورت؛ ۵) کاڵ؛ ۶) نەکولاو، ۷) کاری ڕابردوی جۆش هاتن، کولا، کوڵی؛ ۸) کەلوی دەنکی گیا؛ ۹) کونی شانەهەنگوین ف ۱) بی نمك؛ ۲) شکاف دیوار و یا میان دندانها؛ ۳) دم کوتاه؛ ۴) کوتەگوش؛ ۵) کال؛ ۶) ناپختە؛ ۷) فعل ماضی جوشیدن، جوشید؛ ۸) نیامك دانەهای گیاە؛ ۹) شبکۀ موم.

**کەلێ:** بێخوێ ف بی نمك.

**کەڵی:** ۱) کەڵەکی سەر ئاو؛ ۲) کوڵی؛ ۳) ئازایەتی؛ ۴) کەلو ف ۱) کللك عبور از آب؛ ۲) جوشید؛ ۳) شجاعت؛ ۴) نیامك دانە.

**کەلیجە:** نێری، سابرێن، تەگە ف قوچ.

**کەڵیچە:** کەڵگامێشی لە دوساڵ بەولاوە ف گاومیش دوسال بەبالا.

**کەلێژ:** ۱) کلێنچکەی پەز، قیتکەی سەر دوُگ؛ ۲) دەسەلاتو زۆرداری ف ۱) دنبالچۀ گوسفند؛ ۲) توانایی.

**کەلیژە:** تەگە، نێری ف قوچ.

**کەلیسمە:** کەلۆسمە ف کرمِ آفتِ نخود.

**کەلیش:** کەلۆیش ف نگا: کەلوُیش.

**کەلیشۆ:** ڕێگر، چەتە، کەلەشە ف راهزن.

**کەلیك:** تاوێك، دەمێکی کەم ف زمانی اندك.

**کەلی کوڵکی:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان کە توسط بعثیان ویران شد.

**کەلیلان:** ۱) داخو عەزرەت؛ ۲) کوڵەکوڵی گەرمای هامن ف ۱) تأسّف و حسرت؛ ۲) شدّت گرمای تابستان.

**کەلیلك:** کلیلی دارینی گۆڵەی درگا ف کلید چوبین در.

**کەلیمە:** وشەیەك ف کلمە.

**کەلین:** جۆش هاتن، کوڵین ف جوش آمدن.

**کەلێن:** ۱) قەڵشت لە دیوار؛ ۲) پەناگا؛ ۳) بۆسە، چەپەر، خەڵ، سپێر؛ ۴) دەرفەت ف ۱) شکاف؛ ۲) پناهگاە؛ ۳) کمین؛ ۴) فرصت.

**کەڵین:** ۱) کەلین؛ ۲) مروی زلو زەبەلاح ف ۱) جوشیدن؛ ۲) تنومند.

**کەلێن:** قەلادەی چەرم ف قلادهٔ چرمی.

**کەلی نسێ:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**کەلێنی:** گونـدێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**کەم:** ١) پیچ، بەرانبـەری فرە، کم؛ ٢) کەو، بێژنـگ ف ١) انـدك؛ ٢) غربالِ سوراخ درشت.

**کەمـــا:** گیایەکی بەرزی گەلادەرزی‌یە. *کارگی کە ما لە هەمـو کارگێ باشترە* ف گیاهی است برگ سوزنی، کما.

**کەماجاڕ:** شوێنێ کەمای زۆر لێ ڕوابێ ف کمازار.

**کەماچە:** ئامرازێکی مۆسیقایە ف کمانچه.

**کەماخ:** کلۆت، کەفەڵ ف کفل.

**کەمـالان:** دوگونـدی کوردستـان بەم ناوە بەعسی کاولی کردوە ف دو روستا به این اسم در کردستان توسط بعثیان ویران شده است.

**کەمـان:** ١) دارێکی نیوەجـەغزە ژێی تێخراوە بۆ تیرپێ‌هاویشتن؛ ٢) ئامرازێکی مۆسیقایە ف ١) کمان تیراندازی؛ ٢) کمان موسیقی.

**کەمانچە:** کەماچە ف کمانچه.

**کەمانچەژەن:** کەمانچەلێدەر ف کمانچه‌نواز.

**کەمانگەر:** کەسێ کەمانان چێ دەکا ف کمانگر.

**کەمانە:** ١) زڤرانی ئاوێژراو کە وەشتێ دەکەوێ؛ ٢) چەمانەوەی ئاوێژراو لە ڕێدا ف ١) و ٢) کمانه.

**کەمـاو:** ١) سەرچـاوەیەك کە ئاوی زۆر نەبێ؛ ٢) چێشتی گۆشتـاوی خەست و خوڵ ف ١) چشمهٔ کم آب؛ ٢) یخنی، آبگوشت غلیظ.

**کەمایەتی:** بەرانبەری زۆرینە، کۆمەڵی کەم بەرانبەر بە کۆمەڵێکی تر ف اقلّیت.

**کەمایەسی:** ١) دەست‌کورتی، ئاتاجی؛ ٢) کەم‌وکوڕی‌و ناتەواوی ف ١) احتیاج؛ ٢) کم و کاستی.

**کەمایی:** ١) کەمایەتی؛ ٢) هیچ نەبێ، بەشی کەم ف ١) اقلّیت؛ ٢) اقلاً.

**کەمباخ:** کامباخ ف نگا: کامباخ.

**کەمبارە:** کەم‌فایدە ف کم بهره.

**کەمبـەر:** ١) ناوقـەد؛ ٢) تەسـك؛ ٣) پشتێنی زێڕ یان زیو؛ ۴) گوڵێکی دەشتیە ف ١) میان، کمـر؛ ٢) کم عرض؛ ٣) کمـربند زینتی؛ ۴) از گلهای صحرایی.

**کەمبەرۆك:** دەوەنێکی بەچقڵە کە میوەیەکی هەیە ف خاربنی است میوه‌دار.

**کەمبەرە:** ١) پشتێنی خشڵ؛ ٢) ناوقەد ف ١) کمربند زینتی؛ ٢) میان.

**کەمبەل:** کەمێل ف نگا: کەمێل.

**کەمبەلۆك:** ١) قارچ؛ ٢) چمە، دنبەلان ف ١) قارچ؛ ٢) دنبلان.

**کەمپەر:** ڕکەبەری، خۆڕانان لە حاندیەکێ‌تر ف رقابت کینه‌توزانه.

**کەمپەراندن:** ڕکەبەری کردن ف کینه‌توزانه رقابت کردن.

**کەمت:** دوگمەی قەبە، قوبە ف دکمهٔ قبّه‌ای.

**کەمتار:** قەمتار ف کفتار.

**کەمتاراف:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**کەمتاکورتێ:** کەمێ لە زۆرێ، کەم‌و بێشێ ف کم و بیشی.

**کەمتەرخ:** بێ‌بەها، نارەواج ف بی ارزش.

**کەمتەرخەم:** کەترەخەم ف لاابالی.

**کەمتیار:** قەمتار ف کفتار.

**کەمتین:** بێ‌تاقەت، بێ‌تابشت ف ناتوان.

**کەمجیقڵدانە:** برێتی لە بێ‌سەبر و حەوسەلە ف ناشکیبا.

**کەمچ:** خێچ، چەفت، چەوێل ف کج و ناهموار.

**کەمچك:** کەچك، کەفچی ف قاشق.

**کەمچە:** ١) کەچك؛ ٢) ئامرازی قوڕەسواغ لوس کردن، ماڵە؛ ٣) داغی ئاژەڵ و وڵسات ف ١) قاشق؛ ٢) مالهٔ بنّایی؛ ٣) داغ دام و احشام.

**کەمچیکڵدانە:** کەمجیقڵدانە ف کم حوصله، ناشکیبا.

**کەمخۆر:** دژی زۆرخۆر ف کمخور.

**کەمخە:** پارچەیەکی ئاوریشمیە ف پارچه‌ای ابریشمین.

**کەمدو:** کەم‌قسە ف کم حرف.

**کەمدۆ:** ١) کەسێ کە ئاژەڵی شیردەری کەمە؛ ٢) چێڵی کەم‌شیر ف ١) کسی که دام دوشیدنی کم دارد؛ ٢) گاو کم شیر.

**کەمدوح:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**کەمدەس:** ١) دەس‌تەنگ؛ ٢) بێ‌دەسەلات ف ١) تنگ دست؛ ٢) ناتوان.

**کەمر:** ١) بەرد؛ ٢) خەڵوزەبەردینە ف ١) سنگ؛ ٢) زغال سنگ.

**کەمران:** کانزای خەڵوزەبەردینە: (بەرکەمران ناوی گوندێکە) ف معدن زغال سنگ.

**کەمراوێژ:** پیچەك لە زەحف ف کم از بسیار.

**کەمڕو:** شەرمن، شەرمێون ف خجالتی، کمرو.

**کەمـرە:** کەپـرە، ریخی بەرپێ‌دراوی ڕەق‌هەلاتـگ ف سرگین کوبیدهٔ سفت شده.

**کەمڕی:** کەمڕو ف آدم خجالتی.

**کەمسـەر:** نزیك لە تەواوبوُن ف روبه اتمام.

**کەمشـۆ:** ١) کەری بارەبـەر؛ ٢) زەلامی ناتێگـەیشتو، دەبەنگ ف ١) اُلاغ؛ ٢) آدم نفهم.

**کەمقنیات:** ١) بەکەم‌ڕازی؛ ٢) کەمخۆر ف ١) قانع؛ ٢) کمخور.

**کەمْك:** ١) روخسار چگۆڵە؛ ٢) دەسرۆکەی چڵم‌سڕین ف ١) شخص رخساره کوچك؛ ٢) دستمال.

**کەم‌کار:** ١) کەسێ ئیشی کەم دەس کەوێ؛ ٢) تەمەڵ و بێکارە ف ١) کم کار؛ ٢) تنبل، سست در کار.

**کەم‌کاری:** حاڵی کەم‌کار ف کم کاری.

**کەم‌کردن:** ١) لە زۆر کەم‌بوُنەوە؛ ٢) کزو داڵگۆشت‌بوُن: (بەو نەخۆشیە زۆرم کەم کرد) ف ١) کم شدن؛ ٢) لاغرشدن.

**کەمکۆڵ:** ١) تێخوڵی شینی گوێز؛ ٢) گیایەکی دڕکاوی‌یە ف ١) پوستهٔ

سبز گردو؛ ۲) گیاهی است خاردار.
**کەملتە:** کەستەك، سندەگل، کلۆی گلّ ف کلوخ.
**کەمۆ:** زرنگی فیلزان ف زرنگ حقەباز.
**کەموبیش:** کەمتاکورت ف کم و بیش.
**کەمۆت:** پەلپگر، سەررەق ف لجباز.
**کەموتەر:** کابۆك، کاڤۆك، کەڤۆك، کۆتر ف کبوتر.
**کەمور:** ۱) گاشەبەرد؛ ۲) بەرد، کوچك ف ۱) سنگ بزرگ؛ ۲) سنگ.
**کەموسکە:** برۆکە، پیچەك ف اندکی.
**کەموکوڕ:** ناتەواو ف ناتمام.
**کەموُکە:** کەموُسکە ف اندکی.
**کەمۆ:** کۆدك، کاسەی دارینی زل ف کاسهٔ بزرگ چوبین.
**کەمولە:** کاسەی دارینی پچوُك ف کاسهٔ کوچك چوبین.
**کەمۆڵە:** کەمولە ف کاسهٔ کوچك چوبین.
**کەموینە:** کەس نەدار، بێ‌هاوتا ف نایاب.
**کەمـە:** ۱) هەر دارێ کە جەغـزی یان نیوەجـەغزی چەمێنرابێتەوە بۆ دەورەگرتنی ئامرازێك وەك کەلەبێژنگ‌و داری خوارەوەبوی بێشکەو دەوری پێچکـەی عەرەبـانـەو...؛ ۲) ئامـرازێ کە داری بۆ کەمە پێ دەچەمێننەوە ف ۱) چوب خمیدهٔ دایره یا نیم دایره‌ای، چنبره، کمانی؛ ۲) ابزار کمانی کردن چوب.
**کەمـەر:** ۱) ناوقەد؛ ۲) چیای شاخ؛ ۳) کوچکەبەرد، خڕکەبەرد ف ۱) میان، کمر؛ ۲) کوه تمام سنگی؛ ۳) شن درشت، قلوه‌سنگ.
**کەمەربەست:** نۆکەر، خزمەتکار ف چاکر.
**کەمەربەستە:** بریتی لە پەنابەر ف کنایه از پناهنده.
**کەمەربەن:** پشتێن، پشتان ف کمربند.
**کەمەربەند:** کەمەربەن ف کمربند.
**کەمەرچین:** کراس یان کەوای ژنانەی ناوقەدقرچێنراوی چین‌دار ف لباس کمر چیندار.
**کەمەردوخ:** دەزوی بە خەڕەك ڕێسراو ف رشتهٔ چرخ دوك‌ریسی.
**کەمەرکەش:** ۱) دەستەو سەرەژوُرە، ئاماڵ‌هەوراز؛ ۲) جۆرێ دەرپێ ف ۱) روبەسر بالایی، کمرکش؛ ۲) نوعی زیر شلواری.
**کەمەرن:** بەردەلاّن ف سنگلاخ.
**کەمــەرە:** ۱) کەمــبــەرەی خشـــڵ؛ ۲) ناوقـــەدی هەر شتـێ؛ ۳) جێگەی‌بانگدەر لەسەر منارە؛ ۴) تەختەی لەدۆلاّش‌دراو؛ ۵) ناوەندی زەمین؛ ۶) گاشـەبـەرد ف ۱) کمـر بند زینتی؛ ۲) میان؛ ۳) گلدستهٔ منـاره؛ ۴) تختـه‌ای که بر ناو آسیا کوبیده شود؛ ۵) وسط زمین؛ ۶) سنگ بزرگ.
**کەمەك:** کمەك، تۆزێك ف اندکی.
**کەمەکێ:** کەمەك ف اندکی.
**کەمــەن:** ۱) پەتی درێژ بۆ گرتنــەوەو بەستنی ڕاکـردو؛ ۲) پەتی سەر بەئاڵقەی فرەوان ف ۱) و ۲) کمند.
**کەمەند:** کەمەن ف کمند.
**کەمەندکێش:** بریتی لە عاشق‌بوُنی شێخی تەریقەت یان کچی جوان ف کنایه از مجذوبِ پیر طریقت و عرفان یا عاشق دختر جوان شدن.
**کەمەندهاوێژ:** سوارێ کە بە کەمەند دوژمن یان ڕاکردو دەگرێ ف کمندانداز.
**کەمەی:** ۱) کەمایەسی؛ ۲) کەمایەتی ف ۱) نداری؛ ۲) اندکی.
**کەمی:** دژی زافی، کمی ف کمی، کاستی.
**کەمێ:** کەمەك، کمەك ف اندکی.
**کەمێر:** زۆرکەم، کەمتر ف کمتر.
**کەمیك:** کەفی، کەفیك دەسەسڕ ف دستمال.
**کەمێك:** کەمێ، کەمەکێ، کەمەك ف اندکی.
**کەمێڵ:** ۱) سلەمـەڕی بەپشت دوُگەوەلکاوی پەز کە خلەخلی دێ؛ ۲) پتروی برین؛ ۳) چڵمی وشکەوەبوُگ بە لوُتەوە ف ۱) گال، پوستگاله؛ ۲) خشك ریشه؛ ۳) آب بینی خشکیده.
**کەمێڵە:** کەمێڵ ف نگا: کەمێڵ.
**کەمین:** ۱) بۆسـە، خەڵ؛ ۲) خۆداگرتن لە بوسـەدا ف ۱) کمین؛ ۲) کمین کردن.
**کەمین گا:** بۆسە ف کمینگاه.
**کەمینە:** ۱) کەمایەتی؛ ۲) کەمایی ف ۱) اقلّیت؛ ۲) اقلاً.
**کەن:** ۱) خەنـە، پێ‌کەنین؛ ۲) کان: (گڵ‌**کەن**)؛ ۳) پاشگـری بەواتـا: بەرەڵداکەری بای پشتەوە: (تڕ**کەن**، تس**کەن**)؛ ۴) جێگەی کۆڵدراو؛ ۵) ئاودڕ؛ ۶) جل لەخۆکردن، ژخۆکرنا جلك؛ ۷) کرێژی سەر ف ۱) خنده؛ ۲) معدن؛ ۳) پسوند به معنی بیرون دهندهٔ بادشکم؛ ۴) کنده شده؛ ۵) آبکند؛ ۶) کندن لباس؛ ۷) شورهٔ سر.
**کەنـار:** ۱) ڕەخ، قەراخ، قەراغ، ئالی، لا، تەنشت؛ ۲) داری کونار؛ ۳) دەوەنێکە بۆن‌خۆش ف ۱) کنار؛ ۲) درخت کُنار؛ ۳) درختچه‌ایست خوشبو.
**کەناراو:** ۱) بەستێن؛ ۲) بریتی لە جێگەی دەست‌بەئاوگەیاندن ف ۱) کنارهٔ رودخانه؛ ۲) کنایه از مستراح، توالت.
**کەناربەڕۆژ:** ناوچەیەکە لە کوردستان ف ناحیه‌ای در کردستان.
**کەنارگرتن:** دوُرەپەرێزبوُن ف کناره‌گیری.
**کەنـاروێ:** دوگونـدی کوردستان بەم ناوە بەعسی کاولی کردوە ف دو روستا به این اسم در کردستان توسط بعثیان ویران شده است.
**کەنارە:** ۱) دەوری بەحر؛ ۲) قاڵی درێژوکە؛ ۳) پەراوێز ف ۱) کرانه؛ ۲) قالی کناره؛ ۳) حاشیه.
**کەنارەگیر:** دوُرەپەرێز ف کناره‌گیر.
**کەنارەگیری:** بێ‌لایەنی، دوُرەپەرێزی ف کناره‌گیری.
**کەنـاری:** ۱)دڕکەزی؛ ۲) پەرژین؛ ۳) قەناری ف ۱) خار پرچین؛ ۲) پرچین؛ ۳) پرندهٔ قناری.
**کەنامپەر:** کەنگری وشکەوەکراو ف کنگر خشك شده.
**کەناندن:** خەناندن، وەپێکەنین هێنان ف بەخنده آوردن.
**کەناو:** ۱) ئاودڕ؛ ۲) کۆڵدراو؛ ۳) لە چەسپین ڕزگارکراو ف ۱) آبکند؛ ۲) کنده شده؛ ۳) برکنده شده.
**کەنایا:** هەڵکەندن لەکانزا ف حكّ روی فلز.

**کەنـایش:** ١) کەندنی زەوی؛ ٢) خۆخوراندن؛ ٣) هاوتایی کردن؛ ٤) تاشین و کۆڵین لە کانزاو بەرد [ف] ١) کندن زمین؛ ٢) خود را خاراندن؛ ٣) مقابلەکردن؛ ٤) حكّ روی فلز و سنگ.

**کەناین:** کەنایش [ف] نگا: کەنایش.

**کەنایە:** کەنایا [ف] حكّ روی فلز.

**کەنجـارە:** دوگونـدی کوردستـان بەم ناوە بەعسی کاولی کردوە [ف] دو روستا به این اسم در کردستان توسط بعثیان ویران شده است.

**کەند:** ١) قوڵکە؛ ٢) ئاودڕ؛ ٣) تەپۆڵکە؛ ٤) شانی کەژ؛ ٥) دێ، ئاوایی جگـە لە شار؛ ٦) بەردانی با: (تـرێکی **کەند**)؛ ٧) کان، کەن [ف] ١) چاله؛ ٢) آبکند؛ ٣) تپه؛ ٤) ستیغ کوه؛ ٥) ده، آبادی؛ ٦) فروهشتن باد شکم؛ ٧) معدن.

**کەندا:** هەڵکەندراو لە کانزا [ف] حكّ شده روی فلز.

**کەندار:** دادڕاوی زەوی بەهۆی ئاو یا کندن [ف] زمین کنده شده یا آب شُسته.

**کەنـدارەقوتنی:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد [ف] روستایی درکردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**کەنــدارەقــەل:** گونـدێکـە لە کوردستـان بەعسی وێرانی کرد [ف] از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**کەنداڵ:** ١) دادڕاوی زەوی لە ئاو یان لە ڕُوخان؛ ٢) تەپۆڵکە؛ ٣) گێژاو [ف] ١) زمین فروریخته از آب یا...؛ ٢) تپه؛ ٣) گرداب.

**کەندالا:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد [ف] روستایی درکردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**کەنـداو:** ١) ئاودڕ؛ ٢) ئاوێ کە دو لای وشکـایی لێ چو بێتە پێش؛ ٣) جۆگەی کەنراو بۆ تێکەڵ بُونەوەی دو ئاو [ف] ١) آبکند؛ ٢) خلیج؛ ٣) کانال.

**کەندر:** کنر، کندر [ف] نگا: کندر.

**کەندڕ:** بودڕ، قوڵکەی زۆر قوُڵ و درێژ لە زەوی [ف] گودال عمیق در زمین.

**کەنـدش:** ١) کەنـدن؛ ٢) خورو؛ ٣) خورانـدن؛ ٤) هاوتاکردن [ف] ١) کندن؛ ٢) خارش؛ ٣) خاراندن؛ ٤) جُفت و جورکردن.

**کەنـدغارەقەل:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد [ف] روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**کەنــدن:** ١) کۆڵانی زەوی؛ ٢) جل ژخـــۆکـردن؛ ٣) بەردانی با؛ ٤) لەسەرلابردنی لکاو؛ ٥) دەرکێشانی گیا لە زەوی یان موُ لە پێست [ف] ١) کنـدن زمین؛ ٢) کنـدن لباس؛ ٣) باد شکم درکردن؛ ٤) برکندن چسپیده؛ ٥) برکندن گیاه وموی.

**کەندۆ:** ١) پارێن، پانێر؛ ٢) کۆندۆ [ف] ١) گوسالهٔ دوبهاردیده؛ ٢) نگا: کۆندۆ.

**کەندوُ:** کواڕ [ف] نگا: کواڕ.

**کەندۆخ:** کۆڵەر، کەسێ کە زەوی یان کانزا بۆ نوسین دەکۆڵێ [ف] حکّاك.

**کەنـدۆك:** گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد [ف] از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**کەنـدوقـۆرت:** شوێنی پڕلە چاڵ وچوڵ و بڵندایی و نەویایەتی [ف] زمین دارای پستی و بلندی بسیار.

**کەندوکۆت:** کەندولەند [ف] زمین پرفراز و نشیب.

**کەندوکورت:** کەندوقۆرت [ف] زمین پر از بلندی و پستی.

**کەندە:** ١) خەندەك؛ ٢) چاڵ [ف] ١) خندق؛ ٢) چاه.

**کەنـدەسمە:** ١) کاسەڵەشینکە؛ ٢) ڕەنگرێژە، مێش خۆرە [ف] ١) پرندهٔ سبزقبا؛ ٢) نام پرنده‌ایست.

**کەندەقوُڵان:** ناوی ئاوایی‌یەکە [ف] نام روستایی است.

**کەندەك:** خەندەق، زەوینی کۆڵدراوی درێژ و پان [ف] خندق.

**کەندەکار:** کەسێ کە لە دار نەخش دەکەنێ [ف] کنده‌کار.

**کەندەکاری:** کەندنی نەخش لە دار [ف] کنده‌کاری.

**کەندەلان:** لێواری قوڵکەی زۆر فرەوان [ف] کنارهٔ آبکند گشاد.

**کەندیل:** کەندر [ف] نگا: کندر.

**کەنـدینـاوێ:** مەڵبـەنـدێکە لە کوردستان چەند گوندی لێیە بەعسی وێرانی کردن [ف] ناحیه‌ای درکـردستـان شامل چند روستا که توسط بعثیان ویران شد.

**کەنر:** کنر، کندر [ف] نگا: کندر.

**کەنراو:** ١) زەوی قوُڵ کراو؛ ٢) جلی ژخۆکرای؛ ٣) لەسەر لکاو لاکەوتو [ف] ١) زمین کنده شده؛ ٢) لباس کنده شده؛ ٣) برکنده.

**کەنراوە:** ئاژەڵی قەڵەوبوُگ [ف] دام چاق و چله شده.

**کەنــزە:** ١) جلیقـەی دەس چن؛ ٢) جلکی ژێرکـراس [ف] ١) جلیقـهٔ دستباف؛ ٢) زیرپیراهن.

**کەنسی:** ڕژد، ڕەزیل [ف] خسیس.

**کەنشت:** جۆرێ مومی هەنگوین [ف] نوعی موم عسل.

**کەنشتە:** پەرسگای جوُلەکان [ف] معبد یهود، کنشت.

**کەنْك:** کرێژی برینی سەر [ف] شورهٔ زخم سر.

**کەنکەنە:** زۆر زەلام [ف] بسیار کلفت و بزرگ.

**کەنکەنەچی:** قومەشکەن، کەسێ چاڵاو هەڵدەکەنێ [ف] مقنّی، چاه‌کن.

**کەنگ:** ١) کەند؛ ٢) چەنگی باڵدار؛ ٣) باڵی باڵدار [ف] ١) نگا: کەند؛ ٢) چنگال پرنده؛ ٣) بال پرنده.

**کەنگاوەر:** شارێکە لە مەڵبەندی کرماشان [ف] شهر کنگاور.

**کەنگر:** کنگر، قنگر [ف] کنگر.

**کەنگرکوڵێن:** کوڵاندنی ناتەواو [ف] جوشانیدن مختصر.

**کەنگرۆشك:** ١) دانۆکەکەنگر؛ ٢) بزمارەی پا [ف] ١) کنگردانه؛ ٢) میخچه.

**کەنگروك:** کەنگرۆشك [ف] نگا: کەنگرۆشك.

**کەنگەڵان:** کەندەلان [ف] نگا: کەندەلان.

**کەنگی:** کەنگێ [ف] نگا: کەنگێ.

**کەنگێ:** ١) کام کات؟؛ ٢) لە هەر کاتێکا [ف] ١) کی؟، چه‌وقت؟؛ ٢) در هر زمان.

**کەنگین:** هەر گا، هەر زەمانێك [ف] هرگاه.

**کەنگینێ:** کەنگین [ف] هرگاه.

**کەنن:** ۱) کەنـدن؛ ۲) خەنین؛ ۳) رنینی میوە ف ۱) نگـا: کەندن؛ ۲) خندیدن؛ ۳) چیدن میوه از درخت.

**کەنۆ:** ۱) چێڵی کۆندۆ؛ ۲) پارین ف ۱) نگا: کۆندۆ؛ ۲) گوسالهٔ پارینه.

**کەنوٚ:** ۱) کەندوٚ، کواڕ؛ ۲) پلوٚرە، خەڵیف؛ ۳) کەن، خەندە ف ۱) نگا: کواڕ؛ ۲) کندوی زنبور؛ ۳) خنده.

**کەنۆك:** هەمیشە دەم بەپێکەنین ف خندەرو.

**کەنەسمە:** کەندەسمە ف نگا: کەندەسمە.

**کەنەف:** ئاودەس، کناراو، پێشاو ف مُستراح.

**کەنـەفت:** ۱) زۆر حاڵپەرێشـان، کەلەلا؛ ۲) بەنەحلەت‌کراو لە ئاینی یەزیدیدا ف ۱) بدحال وپریشان؛ ۲) ملعون در آیین یزیدی.

**کەنەفە:** کەنەف ف مُستراح.

**کەنـەك:** ۱) بەردی زل؛ ۲) کەنـدەك، خەندەك؛ ۳) ئاودڕ ف ۱) سنگ بزرگ؛ ۲) خندق؛ ۳) آبکند.

**کەنـەکەوە:** دوگوندی کوردستان بەم ناوە بەعسی کاولی کردوە ف دو روستا به این اسم در کردستان توسط بعثیان ویران شده است.

**کەنەنە:** تیخی کەچك‌کۆڵین ف تیغ قاشق چو بی کندن.

**کەنەوە:** هەڵکەندن ف کندن.

**کەنەهەش:** سەرَبزێو، شەقی ف متمرّد، یاغی.

**کەنی:** ۱) قیز، دۆت، قز، کچ؛ ۲) پێکەنی ف ۱) دختر؛ ۲) خندید.

**کەنێر:** کنێر ف نگا: کنێر.

**کەنێرە:** کنێر ف نگا: کنێر.

**کەنیز:** ۱) قەرەواش، خدامە؛ ۲) ژنی بەپارەکڕدراو ف ۱) کلفت خانه؛ ۲) کنیز زرخرید.

**کەنیزەك:** کەنیز ف نگا: کەنیز.

**کەنیسە:** کلیسا ف کلیسا.

**کەنیشت:** ۱) ریـوٚقی چاو؛ ۲) کەمێڵە ف ۱) ژفـك چشم؛ ۲) ترشح خشکیدهٔ بینی.

**کەنیشتە:** کەنشت ف کنشت، معبد یهود.

**کەنیشك:** کچ، کناچە، دۆت، قز، قیز ف دختر.

**کەنیشکی:** ۱) کچێنی؛ ۲) رەشێنـەی چاو ف ۱) نگـا: کچێنی؛ ۲) مردمك چشم.

**کەنیك:** کچی شوٚنەکردو ف دوشیزه.

**کەنی گری:** فرمێسکی شادی لەچاوهاتن ف اشك شوق.

**کەنیلە:** ۱) کچی چکۆڵە؛ ۲) ناوە بۆ ژنان ف ۱) دخترك؛ ۲) نام زنانه.

**کەنین:** ۱) کەندن؛ ۲) خەنین ف ۱) نگا: کەندن؛ ۲) خندیدن.

**کەو:** ۱) کەف، زەرەژ؛ ۲) سەرەند، سەرەد؛ ۳) کوشینی برین؛ ۴) داغ، چزان بە ئاسنی سوٚرەوەبـوٚگ؛ ۵) کەف ف ۱) کبـك؛ ۲) سردبیزن، غربال سوراخ درشت؛ ۳) فشردن دمل؛ ۴) داغ‌گذاری؛ ۵) کف.

**کەوا:** ۱)بـالاپـوٚشی ئاودامانی پیاوانە؛ ۲) بالاپوٚشی تا بەرپشتێند؛ ۳) کولـەجەی لۆکەتێخراو؛ ۴) کەڵەشاخی خوێن‌بەردان ف ۱) قبا؛ ۲) نیم‌تنه؛ ۳) یلك آستین‌دار؛ ۴) شاخ حجامت.

**کەوات:** کەبات ف نوعی نارنج.

**کەواتە:** هەرگا وایە، جا ئەگەر وایە ف پس دراینصورت.

**کەواخە:** قاپوڕ، قاپێلك ف قشر، پوسته.

**کەوار:** کەندوی ئاردو دانەوێڵە ف کندوی غلّه.

**کەواری:** باڕەکەو، کەوەباڕ ف جوجه‌کبك.

**کەواز:** عاسا، داردەست ف چوبدست، عصا.

**کەواشە:** ۱) ئالاش، چرپی و پوٚش بوٚبن قوڕەبان؛ ۲) برێتی لە هەرشتی سقك ف ۱) انبیره؛ ۲) آت و اشغال.

**کەوال:** ۱) کەڤال؛ ۲) کاژی مار؛ ۳) قەباڵە؛ ۴) سەوال؛ ۵) ماڵات ف ۱) نگا: کەڤال؛ ۲) پوستهٔ مار؛ ۳) سند ماکیّت؛ ۴) نگا: سەوال؛ ۵) اغنام و احشام.

**کەوان:** ۱) کەمان؛ ۲) ئامرازی خوریو لوٚکە شی کردنەوە؛ ۳) هوٚزێکی کوردە لە کوردستـانی بەردەست ترکان ف ۱) نگا: کەمان؛ ۲) کمان پنبه‌زنی؛ ۳) از طوایف کُرد.

**کەوان‌پیتك:** قەڵماسك، قوٚچەقانی، بەرەقانی ف فلاخن.

**کەواندن:** ۱) خستن؛ ۲) داخ کردن ف ۱) بر زمین زدن؛ ۲) داغ گذاردن.

**کەوان‌کشاندن:** ژێ‌کەوان بەتیرەوە کێشان بوٚ هاویشتنی تیر ف کمان کشیدن.

**کەوان‌کێشان:** کەوان‌کشاندن ف کمان کشیدن.

**کەوانوٚ:** کەبانو ف کدبانو.

**کەوانـە:** ۱) کەمـە؛ ۲) تەنراوێکە لە توٚڵ دەکرێتە پاوە بوٚ بەسەر بەفردا ڕوٚیشتن، لاکان؛ ۳) دوخەتوٚکەی کەوانی کە وشەی دەنێودا دەنوٚسن؛ ۴) لای داوێنی مێگـەل لەسـەر هەوێڕ ف ۱) نگـا: کەمە؛ ۲) اسکی ترکه‌ای؛ ۳) پرانتز؛ ۴) دنبالهٔ گله.

**کەوانەدار:** چەماو وەك کەوان ف منحنی قوسی.

**کەوانەدوٚڵ:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**کەوانەکردن:** ۱) وەشت‌کەوتن‌و گەڕانەوە؛ ۲) دەهاویشتن‌دا چەمانەوە ف ۱) و ۲) کمانه‌کردن.

**کەوانەیی:** کەوانەدار ف منحنی قوسی.

**کەوانـــی:** ۱) وەك کەوان چەمـــاو؛ ۲) ئەگەر توٚ بەم جوٚرە نیت ف ۱) کمانی؛ ۲) اگر چنین نیستی.

**کەواو:** کەباب ف کباب.

**کەوایە:** ئەگەر ئاوابێ ف اگر چنین است.

**کەوباڕ:** بێچوە‌کەو ف جوجه‌کبك.

**کەوباز:** کەسێ کە ڕاو بە کەو دەکاو کەوان ڕادەگرێ ف نگهدارندهٔ کبك شکاری، کبك‌باز.

**کەوبوار:** ڕێگەی گەرمێن‌کوێستان‌کردنی کەو ف راه ییلاق و قشلاق کبکها.

**کەوبوێر:** کەوبوار ف نگا: کەوبوار.

**کەوبەدار:** بڕانەوەی بەهار کە کەو لە دار دەنیشن ف اواخر بهار.

**کەوپـەڕ:** ۱) کەوبـوار؛ ۲) ناوی گوندێکە ف ۱) نگا: کەوبوار؛ ۲) نام

دهی است.

**کەوت:** ١) کەڤـوت، کەکەو؛ ٢) بەرەوەبو؛ ٣) کەرکەمەڕ ف ١) درختی است جنگلی؛ ٢) افتاد؛ ٣) تعدادی گوسفند.

**کەوتـــا:** ١) کەوت بەعـــەرزا؛ ٢) تەڕو تلیـس؛ ٣) لەجێدا کەوتن لە نەخۆشی؛ ۴) ڕاکشان، ڕازان، خۆ درێژکردن بۆ خەو ف ١) افتاد؛ ٢) خیس؛ ٣) بر بستر بیماری افتادن؛ ۴) درازکشیدن به قصد خواب.

**کەوتاندن:** خستن بەزەویدا ف بر زمین انداختن.

**کەوْتـانـدن:** ١) حەپینی گەمـاڵ؛ ٢) تۆپـاندن، مراندنی حەیوانێ کە گۆشتی ناخورێ ف ١) عوعوسگ؛ ٢) کشتن حیوان حرام گوشت.

**کەوتش:** ١) کەفتن؛ ٢) داخـۆزین، دابەزین؛ ٣) ئۆقرەگرتن؛ ۴) زۆر ماندگ‌بوُن ف ١) افتادن؛ ٢) پیادەشدن؛ ٣) آرام گرفتن؛ ۴) بسیار خستەشدن.

**کەوتن:** ١) بەربـوُنەوە؛ ٢) نوستنی نەخۆش ف ١) افتادن؛ ٢) بستری شدن بیمار.

**کەوتنەخۆ:** خۆئامادەکردن ف خود را آماده کردن.

**کەوتنەسەر:** خەیاڵ‌لێ‌دان: (**کەوتومەسەرئەوە کە بچم**) ف تصمیم گرفتن.

**کەوتنەوە:** ١) مانەوە لە هەوالآن لە سەفەردا؛ ٢) دوای چابوُنەوە دیسان نەخۆش‌کەوتن ف ١) واماندن در سفر؛ ٢) عودکردن بیماری.

**کەوتو:** بەرەوبوُگ ف افتادە.

**کەوتوُیی:** نەخۆشی گرانەتا ف تیفوس.

**کەوتـە:** ١) دەستـە، قۆڵە؛ ٢) کەوتا؛ ٣) گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف ١) دستە؛ ٢) نگا: کەوتا؛ ٣) نام روستایی در کردستان کە توسط بعثیان ویران شد.

**کەوتەر:** ناوی دێ‌یەکە لە کوردستان ف نام روستایی است.

**کەوتە کەوت:** وەڕەوەڕی سەگان ف عوعوسگها.

**کەوْتی:** ١) تۆپیو؛ ٢) بەربوُیەوە ف ١) لاشۀ نجس؛ ٢) افتادی.

**کەوْتین:** ١) تۆپین؛ ٢) بەربوُینەوە ف ١) سقط شدن؛ ٢) افتادیم.

**کەوجز:** ١) ئاوگەردان؛ ٢) ئەسکوێ ف ١) آبگردان؛ ٢) ملاقە.

**کەجێز:** کەوجز ف نگا: کەوجز.

**کەوچ:** ١) زارخوار؛ ٢) دەفر و ئامرازی قوُڵی خێچو خوارو نارێك؛ ٣) پێوانە ف ١) دهن کج؛ ٢) ظرف دهن کج؛ ٣) پیمانە.

**کەوچك:** کەچك، کەفچی ف قاشق.

**کەوچك‌تاش:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان کە توسط بعثیان ویران شد.

**کەوچکە:** ١) پلوُسکی گەنم لە ئاسیاودا، گەروُلەی ئاش؛ ٢) حەوزۆکەی تارەت‌گرتن لە ئاودەستی یەکسەری مزگەوتان ف ١) ناودان گندم در اسیا؛ ٢) حوضچۀ طهارت در مستراح مساجد.

**کەوچولەوچ:** ١) قسەی مرۆی دم‌خوار؛ ٢) مرۆی دم‌خوار ف ١) سخن آدم دهن کج؛ ٢) آدم دهن کج.

**کەوچە:** ١) دم خوار؛ ٢) کەوچك ف ١) کج دهن؛ ٢) قاشق.

**کەوچەرین:** یەکەم مانگی پایز، خەزەڵوەر، گەڵاڕێزان ف مهرماه.

**کەوچە کەوچ:** کەوچو لەوچ ف نگا: کەوچو لەوچ.

**کەوچێز:** کەپچە ف ملاغە.

**کەودانْك:** جێگەی قاپ‌و قاچاغ، شوێنی دەفر و ئامان ف جای ظروف.

**کەودەری:** باڵـدارێکی جنجیرە بەقەد مریشکێ دەبێ لە نزیك بەفران دەژی ف کبك دری.

**کەودەن:** نازیرەك ف کودن.

**کەور:** ١) بزنـی سپی؛ ٢) کەڤـر، کوچـك، بەرد، سەنـگ ف ١) بُز سفیدرنگ؛ ٢) سنگ.

**کەوراو:** ١) ڕاوەکەو؛ ٢) کەوی ڕاو ف ١) شکار کبك؛ ٢) کبك شکاری.

**کەورْك:** جۆرێ هەرمێ ف نوعی گلابی.

**کەوْرگ:** ئەشکەوت، شکەفت ف غار.

**کەورنگان:** ناوێتەی گەنم لە جۆ یان لە هەرزن ف گندم آمیخته با جو یا ارزن.

**کەوری:** کواڕ، عەماری دەغڵ‌و دانەوێڵە ف انبار غلّه.

**کەورێشك:** کەروێشك، خەروێ، کەروێ ف خرگوش.

**کەورێشکە:** کەروێشکەی سەوزە ف خرام سبزه از باد.

**کەوزەنەك:** باشوُکە، واشە، باڵدارێکی ڕاوکەرە ف قرقی.

**کەوزینال:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان کە توسط بعثیان ویران شد.

**کەوْژ:** ١) بێزو، کەرب؛ ٢) هێشوی ترێ کەبەدارەوە وشك دەبێ ف ١) ویار؛ ٢) خوشۀ انگور بر درخت خشکیده.

**کەوْژین:** ١) بێزوکردن؛ ٢) بەدارەوە وشك‌بوُنی هێشوُی ترێ ف ١) ویار کردن؛ ٢) خشکیدن خوشۀ انگور بر درخت.

**کەوسـەر:** ١) کانیاوێکە لە بەهەشت؛ ٢) ناوێکە بۆ ژنان ف ١) چشمۀ بهشت، کوثر؛ ٢) نامی زنانە.

**کەوسەڵ:** کوُسەڵ، کسڵ ف لاك پشت.

**کەوش:** ١) کەش، بن‌هەنگڵ؛ ٢) پێڵاوی دوراو، قۆندرە؛ ٣) دڵ‌بوُرانەوە ف ١) زیر بغل؛ ٢) کفش؛ ٣) از حال رفتن.

**کەوش‌درو:** کەسێ کە پێڵاو دروس دەکا ف کفاش.

**کەوشدور:** کەوش‌درو ف کفاش.

**کەوشدۆز:** کەوش‌درو ف کفاش.

**کەوشکەن:** لای درگا لە ژوُری ماڵەوە ف کفش‌کن.

**کەوشەك:** سێ‌باز ف نوعی بازی پرشی.

**کەوشەن:** سنوُر، حودوُد، سەرحەد ف مرز.

**کەوشین:** بوُرانەوە، دڵ‌لەخۆچوُن ف غش کردن.

**کەوشێن:** کەوشەك، سێ‌باز ف بازی پرش.

**کەوقژك:** قاژو. *باڵدارێکی ڕەشە گۆشتی دەخورێ* ف از پرندگان حلال گوشت.

**کەوك:** ١) کەڤ، کەو؛ ٢) ڕەنگی عابی ف ١) کبك؛ ٢) آبی روشن.

**کەوکردن:** لەکەودان، بە سەرەند دابێژتن ف با سَرَند بیختن.

**کەوکورد:** گۆگرد ف عُنصر گوگرد.

**کەوکەردش:** کەفی‌کرد ف کف کرد.

**کەوکەڤۆك:** پشیلەپایزە، بەری گیایەکە [ف] قاصدك.
**کەوکەل:** کوکەل، پەپوٗ، پەپوسلەمانە [ف] هُدهُد.
**کەوکـەمانە:** دومەڵێکە لەلای سەروٗی دەمەوە دێت، کوانی مەلاٚشو [ف] دُمَلی که بالای دهان می‌زند.
**کەوکەندەر:** باڵدارێکە لە کەو دەکاو زلترە لەو [ف] پرنده‌ای کبك‌سان و بزرگتر از کبك.
**کەوکی:** سەوزەگیای هەراش. *واتا کەو دەناوی‌دا بێ دیار نیە* [ف] سبزهٔ بالیده و بلند.
**کەوگ:** کەوە، شینی ئاچخ، عابی [ف] آبی روشن.
**کەوگری:** شیوەن، گریانی بەدەنگی بەرز [ف] شیون.
**کەوگی:** جانەوەرێکی پانکەڵەی بۆرە بە پێستی ئاژەڵەوە دەلکیو خوێن دەمژێ، گەنە [ف] کنه.
**کەوگیر:** کەفگیر [ف] کفگیر.
**کەوگیرە:** جۆرێ کوان [ف] نوعی دمل، کفگیرك.
**کەوڵ:** ١) پێستـەی مەڕو بزن وهـەرحـەیوانێ: ٢) سفـرەی چەرم؛ ٣) کورك، پۆسین [ف] ١) پوست گوسفند و بز و دیگر حیوانات؛ ٢) سفرهٔ چرمی؛ ٣) پوستین.
**کەوڵپۆس:** پۆسین [ف] پوستین.
**کەوڵـدرو:** ١) پوسین درو؛ ٢) کەسێ سفرەی چەرمین ئەدورێ [ف] ١) پوستین‌دوز؛ ٢) سفره چرمی دوز.
**کەوڵ کردن:** پێست لەبەر داماڵین [ف] پوست کندن.
**کەوڵکــەر:** ١) کەوڵـدرو؛ ٢) کەسێ پێست لە ماڵات دادەڕنێ [ف] ١) پوستین دوز؛ ٢) پوست‌کن.
**کەوڵـۆس:** ١) کۆڵـۆس، کۆڵـۆز، کەسێ کە ددانی پێشـەوەی نیە؛ ٢) کەندال؛ ٣) گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد [ف] ١) کسی که دندان پیشین ندارد؛ ٢) آبکند؛ ٣) نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.
**کەوڵە:** ١) کەوگ، عابی؛ ٢) جۆرێ کەوگی ورد؛ ٣) جێگەی زەلمی زۆر، ریخەلاٚن؛ ٤) گیاوردیلەی بەهاران کە زۆر زوٗ زەرد دەبێ؛ ٥) گوندێکی کوردستـانـە بەعسی کاولی کرد [ف] ١) آبی روشن؛ ٢) کنـهٔ ریز؛ ٣) ریگستان؛ ٤) سبزهٔ کم عمر بهاری؛ ٥) نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.
**کەوڵەپیر:** گوڵێکی زەردە [ف] گلی است زردرنگ.
**کەوڵەرەش:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد [ف] نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.
**کەوڵەکۆن:** برێتی لە پیری پەك‌کەوتە [ف] کنایه از پیر لکنته.
**کەوڵەیان:** گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد [ف] از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.
**کەولی:** کاولی، خێلاٚتێکی کۆچەرن [ف] کولی.
**کەولێدان:** کەوکردن [ف] سَرَدکردن.
**کەومــار:** باڵــدارێکـی خەیاڵی‌یە دەڵێن لەشی کەوەو سەری مارە [ف] پرنده‌ای افسانه‌ای.

**کەون:** ١) کۆن، لەمێژینە، دێرین؛ ٢) دمهەڵپێچی ژنانە [ف] ١) کهنه؛ ٢) نقاب زنانه.
**کەوندێز:** ئەسکوێ، ئەسکو [ف] ملاغه.
**کەونەلاجان:** ناوی دێ‌یەکە [ف] نام روستایی است.
**کەونینە:** کەونارا، زۆر قەدیمی [ف] باستانی.
**کەوو:** کەوگ [ف] کبود.
**کەوە:** کەوگ، عابی [ف] آبی روشن.
**کەوەت:** کەڤۆت [ف] درختی است جنگلی.
**کەوەر:** ١) سەوزی‌یەکـی دەسچێنی تیژە کە چەنــد ساڵ دەمێنێ؛ ٢) ئەشکەوت، شکەفت [ف] ١) تره، گندنا؛ ٢) غار.
**کەوەرتێ:** لەو گونــدانــەی کوردستـانـە کە بەعسی کاولیان کرد [ف] روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.
**کەوەرتیان:** گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد [ف] از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.
**کەوەڕۆژ:** سپیەڕۆژ، ڕۆژی بێ‌هەتاو [ف] روز بی‌آفتاب، ابری.
**کەوەرە:** توێژاڵکی سەر برین [ف] کبره.
**کەوەڕی:** عاجز، نارەحەت، جاڕز [ف] پکر.
**کەوەژ:** پێست دەگەڵ مو هەڵکندراو [ف] پوستِ با مو کنده شده.
**کەوەسێر:** پەزی ڕوخسارسپی ئاماڵ‌شینی ئاچخ [ف] گوسفند رخ سفید کبود فام.
**کەوەگی:** کەوگی [ف] کنه.
**کەوەل:** جۆرێ بەری مازو [ف] نوعی ثمر مازوج.
**کەوەڵ:** پێست [ف] پوست.
**کەوەلا:** ١) هەموگیان کەسك؛ ٢) کەسکایی گشتی [ف] ١) سبزپوش؛ ٢) همه‌جا سبز.
**کەوەڵە:** ١) کەوگی وردیلە؛ ٢) کەوگ، عابی؛ ٣) ریخەلاٚن؛ ٤) دیمەنی سەوزی دەشت‌و دەر؛ ٥) گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد [ف] ١) کنهٔ ریز؛ ٢) آبی روشن؛ ٣) ریگزار؛ ٤) سبزی دشت و در؛ ٥) نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.
**کەوەمار:** جۆرێ مار کە ئاماڵ‌شین دیار ئەدا [ف] نوعی مار.
**کەوەن:** کوان، زامی ئاماس‌کردو [ف] دُمَل.
**کەوەندە:** چادر، رەشماڵ، تاوڵ، کۆن، خێوەتی لەموٗ چندراو، سیاماڵ [ف] سیاه‌چادر، چادرپشمی ییلاق‌نشینان.
**کەوەی:** چنگنە [ف] نوعی کنه.
**کەوی:** ١) رنو، رنی، کڵێڵە، کلێلە، شاپە؛ ٢) حەمایەت، رام؛ ٣) داغ [ف] ١) بهمن؛ ٢) اهلی، رام؛ ٣) داغِ نشانه‌گذاری.
**کەوێ:** ١) کەوا؛ ٢) ناوە بۆ کچان یانی وەك کەو [ف] ١) قبا، نگا: کەوا؛ ٢) نام زنانه.
**کەویار:** گۆرانی‌یەکی بەناوبانگە [ف] آهنگی است مشهور.
**کەوی‌بوٗن:** رام‌بوٗن، حەمایەت‌بوٗن [ف] رام شدن.
**کەوی‌پسان:** رنو داڕژانەخوار [ف] ریزش بهمن.
**کەویج:** قەفیز [ف] قفیز.

**کەویچە:** دەمی پلوُسکە گەنم لە ئاسیاودا ف دهانۀ ناودان گندم در آسیا.

**کەویّ‌ڕبات:** کەوی شەڕانی ف کبکی که برای شکار کبکهای دیگر در کمینش گذارند.

**کەویژ:** قەفیژ ف قفیز.

**کەویژە:** کەویچە ف نگا: کەویچە.

**کەویژە:** کەویچە ف کەویچە.

**کەویّسار:** کەوەسێر ف نگا: کەوەسێر.

**کەویّسێر:** کەوەسێر ف نگا: کەوەسێر.

**کەویّشین:** کۆترەگایە ف فاختە.

**کەوی کردن:** حەمایەت‌کردن ف رام کردن.

**کەوێڵ:** ۱) کۆخ، کۆختە، خانوی چکۆڵەی یەکچاوە؛ ۲) ئەشکەوت؛ ۳) لەپاش کاسە واتا: ئامانی‌ماڵ: (**کاسەو کەوێڵ**) ف ۱) کوخ؛ ۲) غار؛ ۳) بعد از «کاسە» به معنی ظروف، خانه

**کەوین:** پێکەوە جۆش‌دانی کانزا ف جوش دادن فلزات.

**کەویە:** ۱) کەوی، ڕنو، کلێلە، شاپە؛ ۲) کون‌و خانوی نزم‌و نەوی؛ ۳) گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف ۱) بهمن؛ ۲) بام کوتاه؛ ۳) نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**کەهــۆیی:** ۱) کەسکـایی، سەوزایی‌ڕەنـگ؛ ۲) شینی، کەوەیی ف ۱) سبزرنگی؛ ۲) کبودی.

**کەهـ:** کا، وردەی کلۆش ف کاه.

**کەهال:** تەمەڵ، سست، تەوەزەل ف سست و تنبل.

**کەهر:** کار، کارژیلە، بەچکەبزن ف کهر، بزغاله.

**کهەڕ:** کەڕ، گویّ‌کپ ف کَرّ، ناشنوا.

**کهەڕۆ:** کەڕ ف ناشنوا.

**کەهڕوبا:** کارەبا، شیرەی وشکەوەبوی دارێکە ف کهربا.

**کەهڕوبان:** کەهڕوبا ف کهربا.

**کەهرەبا:** کەهڕوبا ف کهربا.

**کەهریز:** کارێز، کەرێز ف کهریز، قنات.

**کەهرێز:** کارێز، کەرێز ف کهریز، قنات.

**کەهــری‌شەمــزە:** کاریلەی هەراش کەلـەمـانگی ڕێبـەنـدان زاوە ف بُزغالەای که بهمن ماه متولد شده.

**کهەن:** کرێژی‌سەر ف شورۀ سر.

**کەهنی:** کانی، سەرچاوە ف چشمە.

**کەهنیك:** قەڵماسك، قۆچەقانی، بەرەقانی ف فلاخن.

**کەهەر:** کوێت ف اسب کمیت، کَهَر.

**کەهەن:** کۆن، کەون ف کهنه، قدیمی.

**کەهەنگ:** بەرهەنگ، نەخۆشی تەنگەنەفەسی ف بیماری تنگی نفس.

**کەهی:** کەوی، حەمایەت، ڕام ف اهلی، رام.

**کەهیا:** قۆخا، پیاوی بەڕێزی ئاوایی ف کدخدا.

**کەهێل:** ۱) کەحێل، ئەسپی ڕەسـەن؛ ۲) کەهـال، تەمەڵ ف ۱) اسب نجیب؛ ۲) تنبل.

**کەی:** ۱) جێگــە، ماڵ؛ ۲) کام دەم؟؛ ۳) داغ، چزان بە ئاســنــی سوُرەوەبــوُگ؛ ۴) کایە؛ ۵) ژەنــدنـــی تراو ف ۱) جای، کده؛ ۲) چەوقت؟؛ ۳) داغ‌گذاری؛ ۴) گیم، بازی؛ ۵) بهم زدن مایع.

**کەیا:** ۱) کایە؛ ۲) ژەنـدنی تراو؛ ۳) سەرناوی پیاوی زل؛ ۴) قوێخای ئاوایی ف ۱) بازی؛ ۲) بهم زدن مایع؛ ۳) لقب شخص قدرتمند؛ ۴) کدخدا.

**کەیارك:** کارگ، قارچ، قارچك، کوارگ ف قارچ.

**کەیاندن:** ژاندنی تراو: (مەشکەت **کەیاندوە**؟) ف بهم زدن مایع در ظرف.

**کەی‌بڕ:** جۆرێ سەرەتیری پان وەك چەقۆ ف نوعی پیکان لبه پهن.

**کەیبەر:** کەیبڕ ف نگا: کەیبڕ.

**کەی‌پیران:** ۱) ماڵـەبـابـان؛ ۲) کۆنـەماڵی باب‌و باپیران ف ۱) خانۀ پدری؛ ۲) خانەقدیمی اجدادی.

**کەی‌خۆ:** ماڵەخۆی ف خانه شخصی.

**کەیخوا:** ۱) کوێخا، قۆخا؛ ۲) پیاوی ئاقڵ‌و بەمشوُر ف ۱) کدخدای ده؛ ۲) مرد عاقل و مدبّر.

**کەیخودا:** کەیخوا ف نگا: کەیخوا.

**کەیر:** کار، کاریلە، گێسك ف بُزغاله.

**کەیس:** دەرفەت، هەل، فرسەت، دەرب ف فرصت.

**کەیسۆ:** دەرفەت‌هێن، هەلپەرست ف فرصت‌طلب.

**کەیف:** ۱) چۆنیەتی، حاڵ: (**کەیفت** ساز نیە)؛ ۲) خۆشی، شادی: (بە **کەیفە**) ف ۱) حال؛ ۲) شادی.

**کەیف کردن:** خۆش‌ڕابواردن ف خوشگذرانی.

**کەیف‌وەش:** دڵخۆش، بەکەیف ف خوشحال.

**کەیڤەشایا:** وشەی دواندنی خانمی بەڕێز ف کلمۀ محترمانۀ خطاب به خانمها.

**کەیڤەشایە:** کەیڤەشایا ف خطاب محترمانه نسبت به خانمها.

**کەیك:** ۱) قێج؛ ۲) جۆرێ شیرنی ف ۱) کك؛ ۲) کیك.

**کەیکف:** دەوەنێکە ف درختچەای است.

**کەیکوا:** ۱) کەیخودا؛ ۲) کارامەو لێزان ف ۱) کدخدا؛ ۲) کارآزموده.

**کەیل:** ۱) سەرکۆمار، سەدارعێل؛ ۲) شۆخ‌و شەنگ؛ ۳) پڕاوپڕ، دارماڵ ف ۱) ایلخانی، سردار ایل؛ ۲) شوخ و زیبا؛ ۳) مالامال.

**کەیڵ:** کەوێڵ ف کوخ.

**کەین:** ۱) نێوان، ئاشنـایەتی، پەیوەندی: (**کەین‌و** بەینمان خۆشە)؛ ۲) تەگبیرکردن دژی کەسێ ف ۱) ارتباط؛ ۲) توطئه.

**کەین‌وبەین:** کەین ف نگا: کەین.

**کەینەك:** کچ، دۆت، کەنیشك ف دختر.

**کەینەکە:** ۱) کەینەك؛ ۲) کیژۆڵە ف ۱) دختر؛ ۲) دخترك.

**کەینەکەی:** کچایەتی بەرلە شوکردن ف دوران دختری.

**کەینێ:** ۱) کەنگێ؛ ۲) کچێ ف ۱) نگا: کەنگێ؛ ۲) ای دختر.

**کەیو:** کادێن ف کاهدان.

**کەیوان:** ۱) کابان، بناوانی ماڵ؛ ۲) ئەستێرەیەکی گەڕۆکە ف ۱) کدبانو؛ ۲) زحل، ستارۀ کیوان.

**کەیوانو:** کەبانی، کابانی ماڵ ف کدبانو.
**کەیوانە:** کەیوانو ف کدبانو.
**کەیە:** ١) ماڵ، جێگەی لێ ژیان؛ ٢) کوێخادێ ف ١) خانە؛ ٢) کدخُدا.
**کەیەك:** جلشۆری ماڵو خێزان ف رختشو ر منزل.
**کەیەکەر:** ژنی زۆر بەماڵداریو ئاگا لە ماڵ ف کدبانوی مُقتصد.
**کەیەکەری:** بناوانی کردنی ماڵ بەباشی ف ادارهٔ مطلوب خانە.
**کەیەکی:** ئەوجێگەی جلکی لێ دەشۆن ف رختشویی.
**کەیەڵ:** کەوێڵ، کۆخ، کوڵێتە ف کوخ.
**کەیەن:** کۆن، کەون ف کهنە، قدیمی.
**کەیەنەك:** جلکی کۆنی بەتیتۆڵو بزگوڕ ف لباس مُندرس.
**کەیەنی:** کۆنی، کۆنیەتی ف کهنەای.
**کەیەوکولفەت:** ماڵو خێزان ف مال و منال.
**کەیی:** ١) کەوی، رام؛ ٢) ژاو، تراوی تێکدراو ف ١) رام شدە؛ ٢) مایع بە هم زدە شدە.
**کەییر:** دارێکی دەوەنە گوڵی سپی دەکاو بۆنی خۆشە، مۆرد ف درختچهٔ مورد.
**کەییل:** کاول، خەرابە، خاپوُر ف ویران.
**کی:** ١) کام کەس؟؛ ٢) پیتی پێوەند: (زازا**کی**، فارس**کی**)؛ ٣) هێما بۆ تاکێك: (پیاوە**کی** ئازایە) ف ١) چە کسی؟؛ ٢) پسـونـد نـسبت؛ ٣) پسوند وحدت.
**کێ:** ١) کی؟؛ ٢) پاشگـری بەواتـا: چکـۆڵـە: (کچە**کێ** داوەرە)؛ ٣) پاشگـری بەواتـا: کایە: (چاوشار**کێ**)؛ ٤) بارەی ژاندن بۆ جارێك: (**کێ**ی مەشك)؛ ٥) پاشگری بەمانا بۆ ناسین: (کارە**کێ**، ئەشتە**کێ**)؛ ٦) ماڵی تیاژیان، کەی؛ ٧) درگای ماڵو درگای چەپەر؛ ٨) هەرکەسێ، هەرکەس ف ١) چەکسی؟؛ ٢) پسوند تصغیر؛ ٣) پسوندبە معنی بازی؛ ٤) بهـرهٔ یکبـاره از بە هم زدن مشـك؛ ٥) حرف تعـریف؛ ٦) خانە، مسکن؛ ٧) در خانە و در پرچین؛ ٨) هرکس، هرکە.
**کیار:** بێستان، بێستانی کاڵەکو شوُتی ف پالیز.
**کیارك:** دونبەڵان، دۆبەڵان، چمە ف دُنبلان.
**کیاس:** راسپاردن ف سفارش کردن.
**کیاستن:** رەوانەکردن، ناردن ف فرستادن.
**کیاستەی:** کیاستن ف فرستادن.
**کیان:** ژان، لێكدران ف بهم زدە شدن.
**کیانای:** کیاستن ف فرستادن.
**کیبڵە:** قیبلە ف قبلە.
**کێبەرکێ:** رك‌بەرکە لە بازی یان لە کارێك‌دا. ملە ف مسابقە.
**کێبەکیی:** هەرکەس هەرکەسی، پشیوی و ئاژاوە ف هرکی هرکی، بلوا.
**کیپا:** پارچەکرشی پڕکراو لە ساوار یان برنجو کوڵێندراو، گیپە ف گیپا.
**کیپار:** کیپا ف نگا: کیپا.
**کیپاری:** کیپا: (**کیپاری**و چای بەقلاوە زەزای/ خێرا خودێ دای خۆتی بچەرینی) «ناڵبەند» ف نگا: کیپا.
**کێت:** کوێت ف اسب کمیت.

**کێتْك:** کتك، ختك، پشیلە، پشی ف گربە.
**کیتکـە:** ١) کوللێرەی هەرزن؛ ٢) ناوی دێیەکە لە کوردستان ف ١) گردهٔ نان ارزنی؛ ٢) نام روستایی است.
**کیتە:** دیزە، دەفری قوُڵی سواڵەت ف دیزی، دیگ سفالین.
**کێتـە:** ١) تێلا، بەرچیغ، داردەستی ئەستـوُر؛ ٢) قایمـەمێو، داربەستی داری ترێ ف ١) چماق؛ ٢) داربست تاك.
**کیتەڵە:** دیزەی چکۆڵە ف دیزی کوچك.
**کێچ:** قێچ، کەیك ف كك.
**کێچاوا:** ناوی دێیەك لە مەڵبەندی شاروێران ف نام روستایی است.
**کیچە:** کوُچە، کۆڵان، کوُچی ف کوچە.
**کێچەڕەشکە:** جانەوەرێ وردیلەیە بەڵای بێستانە ف حشرە ایست آفت پالیز.
**کێچ هەڵێنان:** ١) قێچ پەیدابوُن لە شوێنێ؛ ٢) برێتی لە وەپەلە کەوتن ف ١) پیدایش كك در جایی؛ ٢) کنایە از شتابزدگی.
**کێچی دەریا:** جۆرێ قرژاڵۆکەیە بە عەرەبی روبیانی پێ ئێژن ف میگو.
**کێخ:** ١) چڵك، پیسی؛ ٢) چرکی برین ف ١) کثافت، چرك؛ ٢) چرك زخم.
**کیخا:** قەیخا، کوێخا، کێخا ف کدخدا.
**کێخا:** کوێخا، قۆخا ف کدخدا.
**کێخوا:** کێخا، قۆخا ف کدخدا.
**کێخمە:** پارچەیەکی ئاوریشمە ف نوعی پارچهٔ ابریشمی.
**کیخی:** کوێخای ناوچەیەك کە دەوڵەت دایناوە ف کدخدای انتصابی دولت.
**کیر:** چوُك، سیرەت ف آلت تناسلی نر، کیر.
**کیڕ:** ١) قرچان، پێست‌هەڵقرچان لە سوُتان؛ ٢) شوُم، بێ فەڕ؛ ٣) کاڵ، نەگەیشتو؛ ٤) روُش ف ١) چروك پوست در اثر سوختگی؛ ٢) نحس؛ ٣) کال؛ ٤) خراش.
**کێر:** ١) کیر؛ ٢) چەقۆ، کارد؛ ٣) کار، شوُل: (**کێر**کار)؛ ٤) فایدە، بەهرە: (ئەو ماڵە **کێر** نایە) ف ١) آلت نر، کیر؛ ٢) کارد؛ ٣) کار؛ ٤) فایدە، بهرە.
**کێڕ:** ١) خەتـی کێشـــان؛ ٢) کەڕ، گوێ‌کپ ف ١) خط کشـیدنی؛ ٢) ناشنوا، کرّ.
**کێڕا:** ١) چزوُ؟، چۆن وا بەپەلە؟؛ ٢) لە کام جێگەوە؟ ف ١) چەزود؟؛ ٢) از کجا؟.
**کێرات:** دەوەنێکە ف درختچە ایست.
**کێراتی:** بەبەهرە، بەکارهاتگ ف مفید.
**کێراکی:** رۆژی یەك‌شەممە ف روز یکشنبە.
**کێران:** ١) زەبەلاح، زرتەبۆز؛ ٢) داری درێژو ئەستوری بانەڕای خانو ف ١) لندهور؛ ٢) دیرك افقی سقف‌خانە.
**کێڕانن:** پێداهێنانو ڕوُشاندن ف کشیدن بر چیزی و ایجاد خراش.
**کیرپك:** کەپەك، کرپك ف نخالە.
**کێرخۆر:** ١) حیز، جندە؛ ٢) قوُندەر ف ١) فاحشە؛ ٢) کونی.

**کێرد:** چەقۆ، کارد، کێر ف کارد.

**کێرد گەر:** چەقۆساز ف کاردساز.

**کێردی:** کاردو، کاردی، گیایەکە شیوی پێ لێ‌دەنێن ف گیاهی آشی.

**کێرزل:** ۱) نێری سیرەت‌زەلام؛ ۲) برێتی لە زۆرکار، کەڵەگا ف ۱) کیر بزرگ؛ ۲) کنایه از زورگو.

**کێرزلی:** برێتی لە زۆرکاری، ناهەقی ف کنایه از زورگویی.

**کێرستون:** پەلکەزێڕینە، کۆلکەزێڕینە، کەسکەسوور ف رنگین کمان.

**کێرسم:** ئاکار، داموو دەستوور، ڕەوشت ف روش.

**کێرقازی:** گیایەکی گەڵایانی بەنەوش‌ڕەنگی تۆخە ف گیاهی است.

**کیرك:** کورك، کوڕوو ف کُرك، موی نرم زیر پشم.

**کێرك:** جەقۆی پچوك، قەڵەمبڕ ف کارد کوچك، قلمتراش.

**کێرکار:** کارەکەر، قەرەواش ف کلفت خانه.

**کێرکەر:** کێرکار ف کلفت خانه.

**کێرکەڵە:** کەڵەی تووتن‌و بێستان ف گیاهی است آفت و انگل توتون و پالیز.

**کێرکەڵەگا:** ۱) کێرکەڵە، کەڵە؛ ۲) کیری وشکەوەکراوی گا کە قەڵەمی قامیشیان لەسەر دەقرتاند ف ۱) گیاه انگل توتون و پالیز؛ ۲) نوعی مقطع قلم نی.

**کێرگو:** کەروێشك، خەروێ، کەرگۆهـ ف خرگوش.

**کێرنج:** کەسێ کە پەموو کوڵکە شی دەکاتەوە، هەلاج ف پنبەزن.

**کیروێ:** ۱) کوێروو، کوڕوو؛ ۲) گوێزی کوێر، گوێزی پووچ ف ۱) سیاهك گندم؛ ۲) گردوی پوك.

**کێروشك:** کەروێ، خەروێ، کەروێشك، کەورێشك ف خرگوش.

**کێروشکە:** کەروێشکە ف خرام سبزه از باد.

**کیرە:** کوورەی خشت‌سوورکردنەوە ف کورهٔ آجرپزی.

**کیرە:** دەنگێ وەك ڕێك‌خستنی شووشە ف صدایی مانند به هم ساییدن شیشه.

**کێرە:** مەشکەی لەدار یان لە تەنەکە لەجیاتی مەشکەی پێست ف مَشك چوبین یا حلبی.

**کێرهاتن:** بەکارهاتن، کێراتن ف بەکار آمدن.

**کێرەفیل:** ۱) هەر شتێکی ناقۆڵاو ناشیرین؛ ۲) قامچی هۆندراو لە چەرم ف ۱) زشت منظر؛ ۲) تازیانهٔ بافته از چرم.

**کێری:** ۱) ملەی کێو، شانی چیا؛ ۲) کێرە ف ۱) ستیغ کوه؛ ۲) نگا: کێرە.

**کێرێ:** گوندێك لە کوردستان کە بەعسی بە بومبای شیمیایی خەڵکیان کوشتوەو پاشان کاولیان کردوە ف روستایی در کردستان کە مردمش توسط بعثیان با بمب شیمیایی قتل عام شده و سپس ویران گشته است.

**کێریان:** پێداخشان‌و ڕووشان ف کشیده شدن و خراشیدن.

**کێریشك:** خەروێ ف خرگوش.

**کیز:** ۱) کووز، قاش لەمیوە؛ ۲) زەمینی تم‌تمان‌و ڕەقەن ف ۱) قاچ میوه؛ ۲) زمین سنگی و سخت.

**کێز:** ۱) قالۆچە، قۆلانچە؛ ۲) ژەن، ژان، لێك‌دانی تراو ف ۱) جُعل؛ ۲) بەهم زنی مایع.

**کێزان:** ژان، لێك‌درانی تراو ف بەهم زدەشدن مایع.

**کێزاندن:** ژاندن ف بەهم زدن مایع.

**کێزر:** ۱) کێزان؛ ۲) کۆزر؛ ۳) بەپرژی ڕواو لە جێگەیەك؛ ۴) کاری سەربەخۆکەر ف ۱) نگا: کێزان؛ ۲) کوزر؛ ۳) روییدهٔ انبوه؛ ۴) خودسر.

**کێزراندن:** ژاندنی مەشکەو... ف به هم زدن مایع.

**کێزری:** بەرهەڵدایی‌و کاری سەربەخۆ ف خودسری.

**کێزك:** قالۆچە، ریخ گلێنە ف سرگین گردان.

**کێزگ:** مێشی یاقلە ف مگس آفت باقلا.

**کێزم:** ۱) دەستەکەدار؛ ۲) دارێ کە وەبەر داری ڕەزی دەدەن ف ۱) چوب کوبیدن در پرچین؛ ۲) چوبی کە تکیەگاه تاك شود.

**کێزن:** حوشترگەڵو، نۆینی ئاو لە سواڵەت ف شترگلو.

**کێزە:** قالۆچە ف جُعل.

**کێزەر:** کێزر ف نگا: کێزر.

**کێزەکە:** کووز، کووزەڵە ف ترتیزك آبی.

**کێزی:** جاڕو ف جارو.

**کێزین:** ۱) حوشترگەڵو، بۆڕی ئاوی لە سواڵەتی سوورەوەکراو؛ ۲) کێزان ف ۱) لولهٔ سفالین مجرای آب، شترگلویی؛ ۲) نگا: کێزان.

**کیژ:** ۱) دۆت، قیز، کچ، کەچ؛ ۲) قرچانی پێست، کیڕ؛ ۳) کام؟ ف ۱) دختر؛ ۲) چروکیدگی پوست؛ ۳) کدام؟.

**کیژان:** ۱) کام؟، کامە؟؛ ۲) کچان، کەچان ف ۱) کدام؟؛ ۲) دختران.

**کیژك:** کام؟، کێهە؟ ف کدام؟.

**کیژکی:** کامە؟ ف کدامین؟.

**کی‌ژوان:** کام لەوان؟ ف کدام از آنها؟.

**کیژوڵە:** چێشکە، پاساری، چۆلەکە، چقیك ف گنجشك.

**کیژۆڵە:** کچی چکۆڵە ف دخترك.

**کیژۆلە:** کیژۆڵە ف دخترك.

**کیس:** ۱) قیس؛ ۲) هەل، دەرفەت؛ ۳) ئەستووربوونی پدوو؛ ۴) شاراوە ف ۱) دسترس؛ ۲) فرصت؛ ۳) آماس لثه؛ ۴) پنهان.

**کێس:** ۱) کیس؛ ۲) کەس، مرۆ؛ ۳) لەبار، شیاو ف ۱) نگا: کیس؛ ۲) کس، شخص؛ ۳) مناسب.

**کیساندن:** شاردنەوە، شیش‌کردن ف پنهان کردن.

**کێسانین:** دەرفەت‌دەس کەوتن ف فرصت یافتن.

**کێستەك:** ۱) کەستەك، کڵۆ؛ ۲) برێتی لە پیاوی ئازا ف ۱) کلوخ؛ ۲) کنایه از مرد شجاع.

**کێستەنە:** پیاوکوشتن ف آدم‌کُشی.

**کیسقە:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان کە توسط بعثیان ویران شد.

**کیسك:** ۱) تورەکەی چکۆڵەی توتن؛ ۲) جزدانی باخەڵ ف ۱) کیسهٔ کوچك توتون؛ ۲) کیف پول.

**کیس کردن:** ١) پەنــەمـانی پدۆ؛ ٢) پیش‌خواردنـەوی تۆڕەیی ف ١) آماسیدن لثه؛ ٢) خشم را فرو خوردن.

**کێس کردن:** کیس کردن ف نگا: کیس کردن.

**کێس لێ هێنان:** دەرفەت هێنان ف فرصت یافتن.

**کێسم:** تەحر، تەرح، بیچم ف شکل، قیافه.

**کێسمە:** باجێك ئاغا دەیسێنێ ف باجی که مالك می‌گیرد.

**کیسۆ:** کسڵ ف لاك پشت.

**کێسۆ:** کیسۆ ف لاك‌پشت.

**کیسە:** ١) کیسك؛ ٢) دەسکێشێ زبره لە حەمام خۆی پێ دەشۆن ف ١) نگا: کیسك؛ ٢) کیسهٔ حمّام.

**کیسەبڕ:** دزێ کە بەریك دەبڕێ‌و پارە دەدزێ، جێو بڕ ف جیب‌بر.

**کیسەکێش:** ١) کەسێ کە لە حەمام خەڵك دەشوا؛ ٢) بریتی لە زمان لوس‌و بەکلکەسوتە ف ١) دلاك حمّام؛ ٢) کنایه از متملّق.

**کیسەڵ:** کیسۆ ف لاك پشت.

**کیسەڵاوێ:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**کیسـەڵـە:** ١) ئامرازێکی قفڵی دارینی درگایە؛ ٢) سن، سون، بەڵای گەنم ف ١) ابزاری در کلون در؛ ٢) حشرهٔ سن آفت گندم.

**کیسەلەمل:** بریتی لە کچی جوان لە ماڵی باوکی ف کنایه از دختر زیبا درخانهٔ پدری.

**کیسەوکەمەر:** جۆرێ پشتێندی چەرم کە پارەی تێدا جێ دەکەنەوە ف همیان، نوعی کمربند.

**کیسەهەڵدرۆن:** بەهومێدبون بۆ شتێ کە لە ئایندەدا بگات ف امیدوار بودن به درآمدی در آینده.

**کیسی:** کیسەڵ، کێسۆ، کیسۆ، کسل ف لاك پشت.

**کیش:** وتەی‌دەرکردنی پەز ف لفظ راندن گوسفند.

**کێش:** ١) قورســایی، سەنــگینــی؛ ٢) پێز: (**کـێش** هاتـنـی هەویرو هەنگـوین‌و...)؛ ٣) راکێش: (پـەتـەکـە **بکێشە**)؛ ٤) تاقەت، توان، تابشت: (**کێشم** نیە ئەم کارە بکەم)؛ ٥) ئەسپابی جوت، نیرو ئامۆر؛ ٦) شەدەی سەر؛ ٧ ئامـرازی ڕاگوازتن: (**بەردکێش، قوڕکێش**)؛ ٨) کەسێ کە ڕادەگوێزێ: (**دارکێش، کاکێش**)؛ ٩) کەسێ کە ڕاکێشان دەکـا: (**گوریس کێش**)؛ ١٠) مژڵەدوکەڵ‌دەر: (**جگەرەکێش**)؛ ١١) کام بنیادەمیش: (**کێش** نارازی‌یە چش)؛ ١٢) پاشگــری بەواتــا: خاوەن: (**ئـازار کێش، زەحـمـەت کێش**)؛ ١٣) ڕەوتی شێعـر ف ١) وزن؛ ٢) کشــدار بودن؛ ٣) کشیدن؛ ٤) تاب و توان؛ ٥) خیش؛ ٦) عمـامهٔ ابریشمی مشکی؛ ٧) ابزار نقل مکان دادن؛ ٨) شخص نقل مکــان دهنـده؛ ٩) کسی که چیزی را می‌کشـد؛ ١٠) پُك زن؛ ١١) هرکسی هم؛ ١٢) پسوند دارابودن صفتی؛ ١٣) وزن شعر.

**کێشــان:** ١) بەراورد بە تەرازو؛ ٢) راکـێشــان؛ ٣) راگوزتـن؛ ٤) مژ لەدوکەڵ‌دان؛ ٥) کێ لەوان؛ ٦) دەربردنی حاڵی ناخۆش؛ ٧) تیخ لە کالان دەرهێنان؛ ٨) یەکسمی مێ لەنێر چاکردن؛ ٩) هەڵگرتنی وێنە یان نوسـینـی نەخش بە قەڵــەم ف ١) وزن کردن؛ ٢) کشیدن؛ ٣) جابــەجـا کردن؛ ٤) کشیدن توتـون؛ ٥) کدام از آنهـا؛ ٦) تحمّـل ناخوشی؛ ٧) آختن تیغ؛ ٨) مادینه را به گشن نشان دادن؛ ٩) برداشتن عکس یا کشیدن تصویر.

**کێشاندن:** کشاندن ف نگا: کشاندن.

**کێشانە:** بەتەرازوکشان ف وزنی.

**کێشانە کردن:** دەتەرازونان ف وزن کردن.

**کێشــانەوە:** ١) کشاندنەوە؛ ٢) دەرهێنان لەپاش تێ‌ڕاکردن؛ ٣) دوبارە دەتـەرازونـان ف ١) نگـا: کشـانـدنـەوە؛ ٢) بیرون کشیدن پس از فروکردن؛ ٣) دوباره وزن کردن.

**کیشتا:** کوژراو ف مقتول.

**کێشتش:** کوژران ف کشته‌شدن.

**کێشتکۆنی:** کشتکانی، لابەلا، تلاوتل ف یك وَری.

**کێشتە:** کشته، کشتا، کوژراو ف مقتول.

**کێشدار:** ١) چیڕ، لەپسان بەدوڕ؛ ٢) بریتی لەکاری زۆرخایەن: (ئەم کارە زۆر **کێشدارە**) ف ١) کِشدار، مقاوم؛ ٢) کنایه از کار وقتگیر.

**کێشــران:** ١) بەراوردکــران بە ترازو؛ ٢) مێ لە نێر چاك‌کردن؛ ٣) راکێشران ف ١) وزن شدن؛ ٢) گشن دادن مادینه؛ ٣) کشیده‌شدن بر زمین.

**کێشراو:** کشاو ف نگا: کشاو.

**کێشك:** ١) کشان بەزەویدا؛ ٢) ئێشك، پاس؛ ٣) قورسایی لەش لەبەر تا ف ١) کشیده‌شدن بر زمین؛ ٢) نگهبانی؛ ٣) سنگینی تن از تب.

**کیشك:** کام، کامە؟ ف کدام؟.

**کیشکا:** کامیان؟ ف کدامین؟.

**کێشکچی:** پاسدار ف پاسبان.

**کێش کردن:** راکێشان، کشاندن ف کشیدن.

**کێش کرن:** کێش کردن ف کشیدن.

**کێشك کێشان:** پاسداری ف نگهبانی.

**کێشك گرتن:** پاسەوانی کردن ف پاسداری کردن.

**کێشکە:** ١) چێشکە، پاساری؛ ٢) لەو گوندانەی کوردستانەکە بەعسی کاولیان کرد ف ١) گنجشك؛ ٢) روستایی درکردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**کێشماکێش:** کەشمەکەش ف کشاکش.

**کێشۆلە:** کێشکە، چوێلەکە، چقیك ف گنجشك.

**کێشــە:** ١) بردنی کڵۆش بۆ سەر خۆیان؛ ٢) شەڕ؛ ٣) دمـەقـاڵـە؛ ٤) ژێرخــاك‌کردنــی لکـی داری ڕەز بەبێ ئەوە کە بی‌بڕن؛ ٥) جۆرێ سەرپـۆشی ژنان؛ ٦) داری ناو هڵۆڵ بۆ پێداهاتنی ئاوی ئەستێر کە بەردرا ف ١) انتقـال غلّهٔ درویده به سرخرمن؛ ٢) نزاع و جنگ؛ ٣) نزاع لفظی؛ ٤) زیر خاك کردن شاخهٔ مو بدون برش، خوابانیدن؛ ٥) نوعی سرپوش زنانه؛ ٦) کُندهٔ توخالی در دهانهٔ استخر برای تخلیهٔ آب.

**کێشهاتن:** لەدوهاتن ف کش آمدن.

**کێشەر:** کێشندە ف کشنده، جاذب.

**کێشەکێش:** شەڕو هەرا ف نزاع و اختلاف.
**کێشەوبەرە:** کەشمەکەش ف کشاکش.
**کێشەوگێرە:** ١) جەنگەی خەرمان کوتان؛ ٢) کێشەکێش؛ ٣) زەحمەت و دەردی سەری ف ١) موسم خرمن کوبی؛ ٢) کشاکش؛ ٣) درد و مشقّت.
**کێشەوە:** گوازتنەوە بەکۆمەڵ: (منداڵ **کێشەوە**ی دەکەن، مێر و **کێشەوە** دەکەن) ف جابجا کردن گروهی.
**کێشەویٚ:** کێشەوە ف نگا: کێشەوە.
**کێشیاگ:** کشاو ف نگا: کشاو.
**کێشیان:** ١) کێشان؛ ٢) هەرکامیش لەوان ف ١) نگا: کێشان؛ ٢) هرکس از آنان.
**کیف:** ١) تورەکەی چەرمین بۆ تێخستنی شت؛ ٢) دەنگی مار؛ ٣) برش، کەڕو؛ ٤) شوش و لەبارو بەژن‌زراو ف ١) کیف چرمی؛ ٢) صدای مار؛ ٣) کفك ترشیده؛ ٤) قدبلند متناسب.
**کێف:** ١) کەژ، کۆ، چیا؛ ٢) ئەشکەوت؛ ٣) کەیف و شادی ف ١) کوه؛ ٢) غار؛ ٣) شادی.
**کیفار:** گیایەکی بەرزی دڕکاوی‌یە لاسکەکەی بە شلکی دەخورێ ف گیاهی است خاردار.
**کیفاندن:** هاشاندنی مار، وشاندنی مار ف صدای مار خشمگین.
**کیفانن:** وژاندن، وشاندنی مار، کیفاندن ف صدای مار خشمگین.
**کیفایەت:** بەس ف کافی.
**کێفرۆشك:** خەروێ، کەروێشك ف خرگوش.
**کیفزال:** قرژاڵ، قرژانگ ف خرچنگ.
**کیفژاڵ:** کیفزال، قرژاڵ ف خرچنگ.
**کیفژاڵە:** نەخۆشی شێرپەنجە ف بیماری سرطان.
**کێفسار:** ناوچیا، کۆسار ف کوهساران.
**کێفسان:** کوێستان ف ١) کوهستان؛ ٢) ییلاق.
**کیفش:** کفش، خۆیا ف کشف، پیدا.
**کیفشینگ:** قرژانگ ف خرچنگ.
**کیف کردن:** کەف کردن. توێژ پەڕینەسەر ترشاو ف کفك برامدن.
**کێف کردن:** رابواردن بەخۆشی ف خوشگذرانی.
**کیفکۆ:** دۆك، دۆکە، شۆك، شۆکەی بەڵای گەلای بێستان و ڕەز ف سپیدك.
**کێفکی:** بۆگەن بوگ ف گندیده، بدبوشده.
**کیفلا:** گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.
**کیفن:** ترشاوی برشاوی ف ترشیدهٔ کفك کرده.
**کیفۆك:** پیفۆك ف گیاهی است با پیازهٔ خوردنی.
**کیفە:** هاژەی مار، دەنگی مار ف صدای مار.
**کێفەرات:** ڕەنج و بەربەرەکانی، خەباتی سەخت ف مبارزهٔ سخت.
**کێفی:** خۆرست، جانەوەرو گیایە کە لە دەشت بێ و بنیادەم کاری تێدا نەکردبێ ف کوهی، وحشی.

**کێفیلە:** کێفی ف نگا: کێفی.
**کێڤ:** کەژ، چیا، کێو ف کوه.
**کیڤار:** قرێژی ئەستوری سەری کەچەڵ ف شورهٔ غلیظ سر.
**کێڤانی:** کەیبانوی ماڵ ف کدبانو.
**کێڤانیە:** کێڤانی ف کدبانو.
**کیڤروشك:** خەروێ ف خرگوش.
**کیڤریشك:** خەروێ ف خرگوش.
**کیڤەچەر:** پوش و پارێ کە پاوانی کەس نەبێ ف چراگاه آزاد.
**کێڤی:** ١) کێفی؛ ٢) قۆشقابی سواڵەت بۆ کەرەو هەنگوین ف ١) کوهی؛ ٢) تعلبکی سفالین.
**کیك:** کام؟، کێهە؟ ف کدام.
**کێك:** کادە، نانەبرنجی، کەیك ف کیك، کادە.
**کیکا:** گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.
**کێکا:** عاشیرەتێکی کوردە ف عشیره‌ای است کرد.
**کێکف:** کەیکف ف درختچه‌ایست.
**کێکۆ:** کەیکف ف نگا: کەیکف.
**کیل:** ١) کول، نەبڕ؛ ٢) خێل ف ١) کُند؛ ٢) لوچ.
**کیڵ:** کەیل، پێوانەی دەخڵ لە دار ف پیمانهٔ چوبین غلّه.
**کێل:** ١) بلند، بەرز؛ ٢) بەردی سەرین و پاینی قەبر؛ ٣) جوانچاکی بالابلند؛ ٤) سەرداری عێل؛ ٥) درون، دورمان؛ ٦) نیشانەی کەوشەن؛ ٧) پێوانەی دانەوێڵە؛ ٨) سابرین، تەگە؛ ٩) جۆرێ کولێرە کە لەبن‌ژیلەمۆ دەبرژێ؛ ١٠) پاپۆکەی مار ف ١) بلند؛ ٢) شاهدقبر، سنگ مزار؛ ٣) زیبای قدبلند؛ ٤) خان ایل؛ ٥) دوخت؛ ٦) علامت مرزی؛ ٧) پیمانهٔ غلّه؛ ٨) شاك، بُزنر؛ ٩) نوعی نان گرده؛ ١٠) چنبرهٔ مار.
**کێڵ:** ١) کۆڵیت؛ ٢) چارداغ؛ ٣) نەخشی بەڕە؛ ٤) کێلی قەبر؛ ٥) جوت و شۆ ف ١) کوخ؛ ٢) گازه؛ ٣) نقش گلیم؛ ٤) سنگ قبر؛ ٥) کشت و شخم.
**کێلان:** کالان ف نیام شمشیر و خنجر.
**کێڵان:** شۆبڕینی زەوی ف شخم زدن زمین.
**کێلانە:** کالانە ف نگا: کالانە.
**کێڵانە:** ناوی گوندێکە ف نام روستایی است.
**کێلانێ:** کێ بەرکێ لە ئاماتج‌پێکاندا ف مسابقهٔ تیراندازی.
**کێڵاو:** شۆدراو، شێوکراو ف شخم‌زده.
**کێلب:** کەڵپ ف ناب، دندان پیشین.
**کێلبۆ:** کەڵپ‌درێژ ف دندان دراز.
**کێلبە:** ١) ددانی پێشەوە؛ ٢) کەڵپەشاخ؛ ٣) چاوگی تەندور، گولۆێنە ف ١) دندان پیشین حیوان؛ ٢) دماغهٔ کوه؛ ٣) بادکش تنور.
**کێلپەنی:** سەگایەتی، بڕیتی لە فێڵبازی و درۆزنی ف کنایه از شیطنت.
**کێلدان:** ١) دادرون، درون؛ ٢) بەرەوژورئاویتن ف ١) دوختن؛ ٢) بەبالا پرتاب کردن.

**کێڵدراو:** کێڵاو ف شخم‌زده.
**کێڵران:** شێوکران، جوُت‌لێ‌کران ف شخم زده‌شدن زمین.
**کێڵراو:** شێوکراو ف شخم زده.
**کێلستوُن:** کێرستوُن، پەلکەزێڕینه ف رنگین کمان.
**کێل‌ڤەدان:** بەرەژوُر ئاویتن، کێلدان ف به بالا پرتاب کردن.
**کیلك:** ١) کلك، قامك، ئەنگوست، ئەموست، تبل، تلی، تل: ٢) قەڵەم، کلك؛ ٣) ریپۆقی چاو ف ١) انگشت؛ ٢) قلم؛ ٣)زَقك چشم.
**کێڵك:** ١) ئامانج بۆ تیر و بەرەقانی؛ ٢) نیشانی سەرسنوُر ف ١) آماج، هدف؛ ٢) علامت مرز.
**کێل کردن:** بڵندکردن ف بالابردن.
**کێلکن:** کۆبوُنەوەی ئاپۆره بەجغز لەدەوری شتێك ف حلقه زدن مردم دور چیزی.
**کێلکەوانه:** قوُچەکه ف انگشتانه.
**کێڵگـه:** ١) زەوی‌و زار؛ ٢) زەمینێ که شێو دەکرێ ف ١) مزرعه؛ ٢) زمینی که شخم زده می‌شود.
**کێلکی:** گلێنەی چاو، گلارەی چەم ف مردُمك چشم.
**کێلکی کوڕ:** بێ‌چاو، کوێر ف کور، نابینا.
**کێلنجی:** سیخوڕمه، مستەکوُڵه ف سقلمه.
**کیلۆ:** کێشانەیەکه هەزار گرام، نیوسیه ف کیلو.
**کێلوانه:** پاساره، سوانه، سەرسوانه ف لبهٔ بام.
**کێلوُده:** قاپێلك ف پوسته.
**کێلوك:** ژنێ که لەسەر ئاینی ئیسلام نەبێ ف زن غیرمسلمان.
**کیلۆمیتر:** پێوانەی ڕێگەیه بەرانبەر به هەزار میتر ف کیلومتر.
**کیلوُن:** قفڵ ف قفل.
**کیلۆن:** قفڵ ف قفل.
**کیله:** ١) کەیل، کیل: ٢) پاشگری پچوُك‌شاندان: (**جوانکیله**) ف ١) پیمانهٔ غلّه؛ ٢) پسوند تصغیر.
**کێله:** ١) کیلەی دەخڵ‌پێوان؛ ٢) تەپاڵەکێویله ف ١) پیمانهٔ غلّه؛ ٢) تاپاله.
**کێلەبەردانێ:** به بەرد هاویشتنەئامانج ف نشانه‌گیری با سنگ.
**کیلەر:** کولێن، جێگەی ئازوقه ف جای آذوقه.
**کێلەسپی:** ١) ناوی کێویکـه له کوردستان؛ ٢) گوندێکه له کوردستان بەعسی وێرانی کرد ف ١) نام کوهی است؛ ٢) از روستـاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.
**کێلەسپیان:** ناوی دێیەکه ف نام دهی است.
**کێلەسیپان:** ناوی دێیەکه ف نام دهی است.
**کێلەشین:** ١) چیایەکـه له کوردستـان؛ ٢) بەردێکی کەوەرەنگـه زۆر کەونارایه له چیای کێلەشین که کەتیبەی پێوەیه ف ١) کوهی است در کردستان؛ ٢) سنگی در کوه «کێلەشین» با آثار باستانی.
**کیلەفڕ:** خەتەجوُتی لەیەکتردوُر ف شیارهای از هم دور درشخم.
**کیلەڤڕ:** گەمەیەکه بەپێنج‌بەردان دەکرێ ف بازی یه‌قُل دوقُل.
**کێلەك:** ١) تەنیشت؛ ٢) تەقەڵ؛ ٣) جۆرێ نانی چکۆڵه بۆ زارۆکان ف ١) پهلو: ٢) بخیه: ٣) نوعی نان.
**کێلەکـان:** لەو گونـدانـەی کوردستـانـه که بەعسی کاولیان کرد ف روستایی درکردستان که بعثیان آن را ویران کردند.
**کێلەکدان:** کلابوُن، لادان له ڕێ ف منحرف شدن.
**کێلەکه:** کەلەکه، خاڵیگه، برك ف تهیگاه.
**کێلەکەوه:** گوندێکی کوردستانه بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.
**کێلەکێ:** کێلەکه ف تهیگاه.
**کێلەندی:** جۆرێ داسی گەوره، کەلەندی ف نوعی داس بزرگ.
**کێلی:** دەم‌وکات ف وقت‌و هنگام.
**کێلێ:** گونـدێکی کوردستـانـه بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.
**کێلێژه:** ١) چەلاك، ئەستوندەکی باریکی درێژ بۆ چادرو کەپر؛ ٢) داری ئەولاولای لاشیپـانه ف ١) ستون باریك خیمه و گازه؛ ٢) چوبهای کناری درب.
کێلێك: ١) تاو، دەموُکه؛ ٢) ژنی نەموسوڵمان ف ١) لحظه، زمان کوتاه؛ ٢) زن نامسلمان.
کیم: زوُخاوی برین ف ریم، خونابهٔ زخم.
**کێم:** ١)زەرداوی برین، زوُخ، زوُخاو؛ ٢) کم، کەم؛ ٣) من کام کەسێکم؟؛ ٤) هەرکسێ من: (**کێم** دەس نیشان کرد بیگرن) ف ١) ریم، خونابهٔ زخم؛ ٢) اندك؛ ٣) من کی هستم؟؛ ٤) هرکسی را که من.
**کێماتی:** کەمایەتی ف کاستی.
**کێماسی:** کەمایەسی، ناتەواوی ف کاستی.
**کێمانی:** ١) کەمایەتی؛ ٢) کیسەی باخەڵ؛ ٣) بەریك ف ١) کاستی؛ ٢) کیف پول؛ ٣) جیب.
**کێماو:** زەرداوی برین ف ریم، زردابه.
**کێماهی:** ١) قسور؛ ٢) کەمایەتی، کەمایەسی ف ١) کوتاهی در کار؛ ٢) کاستی.
**کێمایی:** کەمایەتی ف کاستی، نقص.
**کێمباك:** بێ‌پەروا، چاونەترس ف بی‌پروا.
**کێمبڕ:** زەمینی کەم‌ڕێژەو ف زمین کم حاصل.
**کێمبەر:** باخی کەم‌میوه ف باغ کم حاصل.
**کیمخـا:** ١) فیز، لەخۆبایی بوُن؛ ٢) کیمخوا، پارچەیەکه ف ١) ازخود راضی بودن؛ ٢) پارچه‌ای است.
**کیمخوا:** کێمخه، پارچەیەکی ئاوریشمی ف پارچه‌ای ابریشمی.
**کێمخوا:** کێمباك ف بی‌پروا.
**کێمخور:** کەم‌خۆر ف کم‌خوراك.
**کێم‌ژمێر:** بێ‌ئاقڵ، بێ‌ئاوەز ف کم‌عقل.
**کێم کرن:** ١) زوُخ له برین هاتن؛ ٢) کەم‌کردنی شتی زۆر ف ١) چرك و خونابه از زخم تراوش کردن؛ ٢) کاستن.
**کێم کێم:** کەم‌کەم، هێدی هێدی ف اندك اندك، کم‌کم.
**کێم کێمه:** کەم‌کەمه، وردەورده ف به‌تدریج.

**کێموکوڕی:** کەم‌وکوڕی، ناتەواوی، کەمایەسی ف ناتمامی، کم و کاستی.

**کێم‌هاتن:** ۱) لە بەراوردا بەهەڵەچوون؛ ۲) لە کێشانەوە بە تەرازو کەم‌هێنان ف ۱) پیش‌بینی غلط؛ ۲) کم وزن کردن در توزین.

**کێمەش:** ڕۆیشتنی زۆر لەسەرخۆ، خەرامان ف بسیار آهسته راه‌رفتن.

**کێ‌مەشك:** بەرەمەشکە ف کرهٔ حاصل یك بار مشك بەهم زدن.

**کێمی:** کەمی، نوقوستانی ف کمی، کاستی.

**کیمیا:** زانستێکە ف کیمیا، شیمی.

**کیمیاگەر:** زانای کیمیا ف کیمیاگر، شیمیست.

**کیمیایی:** ۱) کیمیا؛ ۲) بریتی لە کاری زۆر بەقازانج: (سنعات **کیمیاییە**)؛ ۳) شتێ کە بە دەگمەن دەس کەوێ: (هێلکەشیان لێ کردین بە **کیمیایی**) ف ۱) کیمیا؛ ۲) کنایە از کار بسیار پرسود؛ ۳) کنایە از نادر و کمیاب.

**کێمیڤە:** بەلانی کەم، هیچ نەوێ ف اقلاً، حداقلّ.

**کین:** ۱) رك، قار؛ ۲) کام کەسانین؟؛ ۳) کام جێگە؟ ف ۱) کینە؛ ۲) کیانند؟؛ ۳) کجا؟.

**کێن:** ۱) پارچەی ڕەشماڵ، کوێن؛۲) وشەی پرسیار، کامە کەسن؟؛ ۳) کام جێگە؟ ف ۱) پارچەی سیاه چادر؛ ۲) کیانند؟؛ ۳) کجا؟.

**کێنا:** کیژ، کەنیشك ف دختر.

**کێنات:** کالان ف نگا: کالان.

**کێنج:** گیرۆیی، گرتنەوەی نەخۆشی ف سرایت بیماری، واگیری.

**کێندەر:** کام جێگە، کوێندەرێ ف کدام جای، کجا؟.

**کێندەری:** وشەی پرس، خەڵکی کام جێگەی؟ ف کجایی هستی؟.

**کێندەرێ:** کێندەر؟ ف کجا؟.

کین‌فس: کیسەڵ، کێسو ف لاك پُشت.

**کینگ:** قنگ، قوون ف کون.

**کینگا:** کەنگی؟ کەی؟ ف چەوقت.

**کێنو:** رکوونی، بوغزلەزگ ف کینەتوز.

کینە: ۱) رك، کین؛ ۲) ئەوانە کێن؟ ف ۱) کینە؛ ۲) کە هستند؟.

**کینەدار:** رکوونی، رك لەزگ ف کینەتوز.

**کینەکێش:** رك‌هەڵگر ف کینەور.

**کێنی:** کانی، سەرچاوە، کەهنی ف چشمە.

**کێو:** ۱) چیا، کەژ، کۆ؛ ۲)کام کەس لە ئێوە؟ ف ۱) کوه؛ ۲) کدام از شما؟.

**کێوات:** ناوچیا، کۆسار، کۆساران ف کوهساران.

**کیوار:** کیفار، گیایەکە دڕکاوی ف نگا: کیفار.

**کیوْر:** کاهو، خاس ف کاهو.

**کێوژ:** کەویژ، کەویج ف قفیز.

**کێوسار:** کێوات ف کوهستان.

**کێوسان:** ۱) کێوات؛ ۲) جێگەی بەفرگرو سارد ف ۱) کوهسار؛ ۲) سردسیر.

**کێوستان:** کوێستان ف نگا: کوێستان.

**کێومال:** بەکۆمەڵ گەڕان بەدوی شتێکدا: (**کێومالْمان** کرد ڕێویمان پەیدا نەکرد) ف پیگرد گروهی درکوە.

**کیوون:** ۱) کوتکی ئاسن بۆ بەردشکاندن؛ ۲) لاسکەگیای باریکی کلۆر ف ۱) پتك آهنین؛ ۲) ساقهٔ باریك و کاوك گیاه.

کێوە: بۆکوێ؟، بۆ کام جێگە؟ ف بەکجا؟.

**کێولان:** کێوات ف کوهستان.

**کێوەلی:** کاولی ف کولی.

**کێوی:** کۆڤی، سەربەکێو ف کوهی.

**کێویلە:** ۱) کێفیلە، گیاو بەری خۆرسك؛ ۲) تەپاڵەی دەشتی ف ۱) کوهی، وحشی؛ ۲) تاپالە.

**کێویلکە:** کێویلە ف نگا: کێویلە.

**کیە:** ۱) ترۆپ، چڵەپۆپە؛ ۲) ڕێژاو؛ ۳) چکەسە؟؛ ۴) ماڵ، خانوی تیاژیان ف ۱) قلّە، بلندترین نقطهٔ کوه؛ ۲) مصب؛ ۳) کیست؟؛ ۴) خانە، مسکن.

**کێهانە:** کامانە؟ ف کدامین؟.

**کیەر:** ۱) کارژیلە، کارژۆڵە، کار؛ ۲) بزن ف ۱) کهر، بزغالهٔ نوزاد؛ ۲) بز.

**کێهە:** کام؟ ف کدام؟.

**کێهەی:** کام لەوان؟ ف کدام از آنها؟.

**کێهەیان:** کامی لەوانە؟ ف کدام از اینها؟.

**گ:** ١) تێکرا، بەتەواوی، بێ کەمو کوڕی؛ ٢) پاشگری بەرکاری: (بوگ، چوگ)؛ ٣) پیسایی بنیادەم، گو؛ ۴) کە، کو ف ١) همه، کل؛ ٢) پسوند مفعولی؛ ٣) مدفوع آدمی؛ ۴) حرف ربط.

**گا:** ١) زل،قەبە: (گابەرد، گاحوڵ)؛ ٢) جار، دحفە، کەڕەت، چەل؛ ٣) جێ، شوێن؛ ۴) دەم، کات؛ ۵)نێری چێڵ ف ١) کلان؛ ٢) بار، دفعە؛ ٣) جای؛ ۴) گاه؛ ۵) گاونر.

**گائەل:** کۆمەڵی گاو چێڵ ف گاوان، گلە گاو.

**گائەنگێو:** جۆرێ ماری باریك‌و کەوە ف نوعی مار.

**گابار:** ١) کاروانێ کە چێڵ‌و گایان بارکردوە؛ ٢) گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد ف ١) کاروانی کە بار بر گاوان نهادەاند؛ ٢) روستایی در کردستان کە بعثیان آن را ویران کردند.

**گابارە:** ١) شکێڕ، قەڵشەشاخ؛ ٢) گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد ف ١) شکاف درصخرۀ کوە؛ ٢) از روستاهای ویران شدۀ کردستان توسط بعثیان.

**گاباری:** ناوی عەشیرەتێکە لە کوردستان ف نام عشیرتی در کردستان.

**گابازەڵە:** ناوی دێ‌یەکە لە ناوچەی شاروێران ف نام دهی درکردستان.

**گابڕە:** گیایەکە وەك زەل لەناو تالاوا دەڕوێ ف گیاهی است کە در مرداب روید.

**گابنە:** ئەو گایە کە دەکەوێتە ناوەڕاستی گێرەوەو لە ڕاستەخۆی دەسوڕێ ف گاو بنە در خرمن کوبی.

**گابنەوەر:** گابنە ف گاوبنە.

**گابنێزك:** گابنێسك، نەخۆشیەکە لە ئەستۆی گا پەیا دەبێ، گوێڕەپەی گا ف بیماری نُکاف گاو.

**گابنێزکی:** گابنێزك ف نُکاف گاو.

**گابنێسك:** گابنێزك ف نُکاف گاو.

**گابۆڕ:** ١) شین‌و قیڕ و هوڕی گائەل کە خوێنی گای سەربڕاو دەبینن؛ ٢) شین‌و گریانی بە دەنگی بەرز ف ١) صدای بەهم آمیختۀ گاوها هنگام دیدن خونِ گاو ذبح شدە؛ ٢) شیون وگریە با صدای بلند.

**گابەرد:** بەردی زل ف سنگ بزرگ، خرسنگ.

**گابەڵەك:** ١) باڵدارێکە لە کۆتر بچوکتر؛ ٢) کێوێکە لە قەندیلی کوردستان ف ١) پرندەای است؛ ٢) کوهی در کردستان.

**گاپ:** زبارە، گەل، هەڕەوەز ف کار تعاونی.

**گاپڵ:** کۆترەگایە، کۆتری درشتی شین‌ڕەنگی کێوی ف فاختە.

**گاپلوك:** گیایەکە ف گیاهی است.

**گاپوش:** وردەپوشی بێ‌قەوەت ف علف ریز خشکیدە.

**گاپەرچوك:** لەوەڕێکە گا حەزی لێ‌دەکا ف علفی است مطبوع گاو.

**گاپەرچێقك:** گاپەرچوك ف علفی است مطبوع گاو.

**گاپەرچینکە:** گاپەرچوك ف علفی است کە گاو آن را بسیار دوست دارد.

**گاپەڵ:** گاپڵ ف کبوتر چاهی.

**گاپێ:** برێتی لە تەپ، تەمەڵ لە ڕێ‌ڕۆیشتن ف کنایە از سست و تنبل در راە رفتن.

**گاپیس:** ناوی دێ‌یەکە لە موکوریان ف نام روستایی درکردستان.

**گاپێڵ:** ١) گاپڵ؛ ٢) گای شاخ‌پێچ‌خواردو ف ١) فاختە؛ ٢) گاو شاخ پیچیدە.

**گاپیلۆن:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان کە توسط بعثیان ویران شد.

**گات:** نزاو نوێژلە ئایینی زەردەشتی‌دا ف عبادت در آیین زردشتیان.

**گاتو:** شاتو، توی سور ف شاهتوت.

**گاج:** قڕقڕە، هەرچێ هەودادەزوی لەسەر هەڵدەکەن ف قرقرە.

**گاجۆت:** گاجوت ف گاو شخم‌زنی.

**گاجوت:** گایێ کە زەوی دەکێڵێ ف گاو شخم‌زدن.

**گاچاڵ:** قوڵکەی زۆر فرەوان‌و قوڵ ف چالۀ بزرگ.

**گاچاو:** نەخشێکە لە بەڕەو مافورەدا ف نقشی بر قالی وگلیم.

**گاچاوە:** گاچاوە ف نگا: گاچاو.

**گاچوان:** داردەستی سەرچەماوی ئەستور ف چوگان کلفت.

**گاچەڕێن:** شوانی گائەل ف گاوچران.

**گاچەڕینك:** کلك‌هەڵتەکێنە ف دُم‌جُنبانك.

**گاچێڕ:** گاوان ف گاوچران.

**گاچێڕین:** بەرگاییلکە، کلك‌هەڵتەکێنە ف دُم‌جنبانك.

**گاحۆل:** بریتی لە زەلامی گێلۆکە ف کنایه از تنومند کم‌خرد.

**گاخ:** ١) جەغـز، جغز؛ ٢) جەغزێکە بۆ سوێندتێداخواردنی یەزیدی ف ١) دایره؛ ٢) دایره‌ای که یزیدی‌ها بر زمین می‌کشند و در آن سوگند می‌خورند.

**گاخۆنی:** بەکـۆمەڵ گەڕانی زارۆکان بۆ جێژنانەوەرگرتن ف عیددیدنی دسته‌جمعی بچّه‌ها برای گرفتن عیدی.

**گادار:** شوێنێ کە گای لێ دەچەرێنن ف چراگاه گاوان.

**گادان:** ١) لەکەڵ کێشانی چێڵ؛ ٢) قازانج لە مامڵەدا ف ١) گشن‌دادن گاو؛ ٢) سودبردن در معامله.

**گادانە:** ١) کزن؛ ٢) گلێنەی‌چەم، گلارە ف ١) گاودانه؛ ٢) مردُمك چشم.

**گادك:** کرش، عوُر ف شکمبه.

**گادمە:** گیایەکە بۆ دەرمان دەشێ ف گیاه دارویی گاوزبان.

**گادۆش:** دەفرێ کە چێڵی تێ دەدۆشن ف ظرف گاودوش.

**گادۆشکە:** گادۆش ف ظرف گاودوش.

**گادۆشە:** گادۆش ف ظرف گاودوش.

**گادومە:** گادمە ف گاوزبان.

**گادەر:** ناوی چەمێکە لە کوردستان ف نام رودی است.

**گادەمە:** گادمە ف گاوزبان.

**گادێر:** ١) خاوەن‌گا؛ ٢) گاچەڕێن ف ١) گاودار؛ ٢) گاوچران.

**گادێری** ١) کاری ڕەشەوڵاغ ڕاگرتن؛ ٢) ڕەشەوڵاغ لەوەڕانـدن ف ١) گاوداری؛ ٢) گاوچرانی.

**گادین:** دوپشك، دمارەکوڵ ف عقرب.

**گار:** ١) پاشگر بەواتا: کارکەر: (آموٚژگار)؛ ٢) زۆران: (ڕۆژگار)؛ ٣) دەم: (شەوگار شەق بو)؛ ٤) دەنگی مریشکی هێلکەکەر؛ ٥) گوارە، خشڵی گوێ ف ١) پسـونـد فاعلی؛ ٢) جمـع؛ ٣) وقت، هنگام؛ ۴) کراخ، صدای مرغ تخمگذار؛ ۵) گوشواره.

**گاراج:** پشتێری ترومبێلان ف گاراژ.

**گاراژ:** گاراج ف گاراژ.

**گارام:** ١) مەسـاسـەی دەستی جوت‌کەر؛ ٢) تێڵای ئەستـوُر ف ١) غاوشنگ؛ ٢) چوبدست کلفت.

**گارامە:** گارام ف نگا: گارام.

**گاران:** دەنگەدەنگی مریشکی هێلکەکەر ف کراخ.

**گاڕان:** ١) کۆمـەڵی ڕەشـەوڵاخ، چێڵ و گاو گامێش؛ ٢) داری دەستی جوتێر لە کاتی شێوکـردنا کە سەرێکی بەبزمارو سەرێکی بەپیشکانە، مەساسە ف ١) رمهٔ گاو؛ ٢) چوبدست شخم‌زن.

**گاراندن:** دەنگەدەنگ‌کردنی مریشك کە هێلکە دەکا ف کراخیدن مرغ تخمگذار.

**گارانن:** گاراندن ف نگا: گاراندن.

**گاردی:** جانەوەرێکی وەك جاڵجاڵوکەی زل ڕەنگی زەردە، هەڵەپەزە ف رُتیل.

**گارس:** جۆرێ هەرزنی درشتە بە هێشو دەبێ، زورات ف گاورس.

**گارگارۆ:** هێلانەی لەدار کوڵدراو ف لانهٔ در درخت حكّ شده.

**گارم:** گاڕان، مەساسەی دەستی جوتکەر ف غاوشنگ.

**گارنـگ:** شتێکە وەك دەمەبێڵ لە سۆڵ دەیتەنن دەسکی هەیە لە کاتی خۆیان کوتانا ڕیخی گاگێرەی پێ دەگرن تا نەکەوێتە ناو دەخڵەکەوە، گوُگرە ف مدفوع‌گیر گاو در خرمن کوبی.

**گارنگـان:** گیایەکـە شیرەکـەی مایەی بەلەفیرەیە ف گیاهی است که شیره‌اش مُسهل است.

**گارۆ:** گارگارۆ، هێلانەی مەل لە کونی داردا ف لانهٔ پرنده در سوراخ درخت.

**گاڕۆن:** گاڕان ف نگا: گاڕان.

**گارە:** گار، دەنگی کەرگی هێلکەکەر ف کراخ.

**گارەش:** ڕەشەوڵاغ، ڕەشەماڵ، گاو چێڵ و کەڵ و گامێش ف چارپا، دام غیر از گوسفند و بز.

**گارەڤـا:** گونـدێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**گارەگار:** گارەی زۆری مریشك ف کراخ کراخ مُرغ.

**گارەیا:** گونـدێکی کوردستـانـە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**گاری:** عەرەبانەی لەسەر دو چەرخ کە ئەسپ دەیکێشن ف گاری.

**گاریتە:** کاریتە ف بالار.

**گارێنگ:** گارنگ، گوُگرە ف سرگین گیرهٔ گاو.

**گاریە:** ١) گاری؛ ٢) کونـدەی گەورەی ناوکێش کە لەسـەر بارەبەری دادەنێن ف ١) گاری؛ ٢) خیگ بزرگ سقّا که بر ستور نهند.

**گاز:** ١) بەددان‌گرتن؛ ٢) خەت لەدارکـردن بە تیخ، لەلـە؛ ٣) ئامرازی بزمارکێشانەوە؛ ۴) بەشی جارێك ئاگر لە پۆشۆ؛ ۵) بانگ: (بچۆ بابت گازت دەکـا)؛ ۶) زنجیرەکێو؛ ٧) لا، ئالی: (ماڵیان لەوگازە بو)؛ ٨) بۆخی ئاگرو...: (ئـەم خەڵوُزە گازی هەیە)؛ ٩) شکێر، قەڵشتەشاخ؛ ١٠) شیوی زۆر تەنـگ؛ ١١) درێژایی لە جومگـەی دەستـەوەتاشان؛ ١٢) بوغـاری نەوت کە لە ژێر زەوی دێتـەدەرو بۆسـوُتـانـدن کەڵکی لێ‌وەردەگرن؛ ١٣) گەز، پیوانـەی درێژایی پێوان؛ ١۴) پەلی ئاژەڵ، دەست‌وقاچی حەیوان؛ ١۵) ترۆپك، بڵندترین جێگەی چیا ف ١) گاز دندان؛ ٢) شیارزدن چوب؛ ٣) کلبتین، انبر؛ ۴) پودهٔ لازم برای یك بار بر پاکردن آتش؛ ۵) صدازدن؛ ۶) رشته‌کوه؛ ٧) طرف؛ ٨) گاز، یکی از حالات ماده؛ ٩) شکاف در کوه‌سنگی؛ ١٠) درهٔ تنگ؛ ١١) طول دست از مُچ تاشانه؛ ١٢) گاز طبیعی قابل اشتعال؛ ١٣) متر، گز؛ ١۴) دست و پای حیوان؛ ١۵) قُلّه.

**گازاو:** ناوی کانی گەرمك، گڕاو ف آب چشمهٔ گرم، آب معدنی.

**گازتین:** جێ کۆبوُنەوە بۆ سانەوە ف کلوب، باشگاه.

**گازر:** قەسار، جلشۆر ف قصّار، گازُر.

**گازك:** گازی بزمارکێشانەوە ف کلبتین.

**گازکـردن:** بڕین و قەڵشی چکۆڵە تێکردن ف شکاف کوچك در چیزی ایجاد کردن.

**گازگاز:** دادو هاوار ف فریاد و فغان.

**گازگرتن:** بەددان گرتن، قەپ لێ گرتن ف گازگرفتن.

**گازن:** ۱) سەرکۆنەی دۆستانە؛ ۲) شفرەی زیندرو؛ ۳) شکایەت ف ۱) عتاب؛ ۲)شفرهٔ سرّاجان؛ ۳) دادخواهی.

**گازندۆك:** بەپرتەو بۆڵە، دەم بەگلەیی ف غرولندکن.

**گازنـدە:** ۱) سەرکـۆنەی دۆستانە: (شاکی سسیلاح هەردەم بە کوشتنا مەلێ هات/ **گازندە**یان ژکی کەم؟ ژکی بکەم شکایەت؟) «جزیری»؛ ۲) شکایەت ف ۱) عتاب دوستانە؛ ۲) شکایت.

**گازۆر:** بەتاقەت و توان، بەقەوەت ف نیرومند.

**گازۆز:** ۱) جا.نـەوەرێکـە خوری دەخـوا، مۆریانـە، مۆرانە؛ ۲) ئاوی گازدار ف ۱) بید، حشرهٔ پشم‌خوار؛ ۲) نوشابهٔ گازدار.

**گازۆك:** قامیشی دەم‌قەڵشێنراو بۆ گرتنی مار ف نی سر شکافته برای مارگیری.

**گازولـك:** ۱) کێزك، قالـۆنچەی ڕیخ گلێن؛ ۲) کەرمێش ف ۱) جُعَل، سرگین غلتان؛ ۲) خرمگس.

**گازە:** ۱) دەنگ هاتنی گۆرانی؛ ۲) بۆڵەو پرتە؛ ۳) شفرەی چەرم بڕ ف ۱) صدای ترنّم؛ ۲) غرغر؛ ۳) شفرهٔ کفّاشان.

**گازەدۆك:** شیوەڵەی تەنگ ف درّهٔ تنگ.

**گازەرا:** ناوەڕاستی پشت ف ستون فقرات، وسط پشت.

**گازە گاز:** دەنگەدەنگ، هەراهەرا ف سر و صدا.

**گازەل:** خەزەڵ، گەڵای سۆر هەڵگەڕاوی خەریکی وەرین ف برگ خزان.

**گازەندە:** گازندە ف نگا: گازندە.

**گازی:** بانگ، بەدەنگ هەرالێ کردن ف صدا کردن، بانگ.

**گازیابەز:** هەوایەکە شوان بە بلوێر دەی‌ژنن بۆ پەز کۆکردنەوە ف آهنگی است کە چوپانان با نی می‌نوازند.

**گازی پشت:** دوڕپشت ف وسط پشت.

**گازیز:** ۱) گازۆز، کرمی خوری‌خور؛ ۲) کرمی ناودارو میوە ف ۱) حشرهٔ بید؛ ۲) کِرم نباتات.

**گازی کرن:** بانگ‌کردن ف صدا کردن، خواندن.

**گازی کەر:** کەسێ کە بانگ لە کەسێ دەکا ف صداکنندە.

**گازین:** ۱) شکـــایەت‌کردن، گلی؛ ۲) دەردی‌دڵ‌کردن ف ۱) شکـایت کردن؛ ۲) درد دل کردن.

**گاژ:** گلۆڵە، گلۆك ف نگا: گلۆڵە.

**گاس:** ۱) وەختی وا هەیە؛ ۲) ئەشێ، ڕێی تێ دەچێ؛ ۳) گاز، بانگ ف ۱) گاه باشد؛ ۲) شاید؛ ۳) خواندن، آواز سردادن.

**گاسار:** ۱) کۆلکەی مێو کە لەپاش بڕین دەمێنێ؛ ۲) داری دوحاچەی سەری گوریسی دابـەستن ف ۱) تەشاخەهای باقیماندهٔ مَو پس از بُریدن؛ ۲) چوب دوشاخەای کە یك سر طناب را بدان محکم می کنند.

**گاستـار:** هێچـك، ئاڵقەی دارینی سەری گوریس ف حلقهٔ چوبین بە طناب بستە شدە.

**گاستین:** گازتین، جێگەی کۆبوُنەوە بۆ سانەوە ف باشگاە، کلوب.

**گاسك:** گازك ف گازانبر.

**گاسکە:** ۱) بانگ بکە؛ ۲) قرۆسکەی سەگ ف ۱)صدا کن؛ ۲) صدای لابهٔ سگ.

**گاسن:** ۱) ئاسنی نوُك‌تیژ کە لە دەندەی ئاموُر دەخرێ و عەرزی پێ دەکێڵن؛ ۲) مەیدان، گۆڕەپانی ناوندی گوند ف ۱) گاوآهن؛ ۲) میدان وسط آبادی.

**گاسنگە:** مەیدانی فرەوانی، ناوەندی ئاوایی ف میدان مرکز آبادی.

**گاسنوُق:** سندوُقی زل لە پۆلا ف گاوصندوق.

**گاسنە:** جارێك کێڵان: (شومەکەم دوگاسنە کردوە) ف یك بار شخم‌زدن.

**گاسۆس:** گیایەکە دەگەڵ ژاژی دەکرێ ف گیاهی است کە با کتخ آمیزند.

**گاسی:** گازی ف صدا.

**گاشـە:** ۱) بەردی زل، کەڤرێ مەزن؛ ۲) ئاژاوەو پشێوی ف ۱) سنگ بزرگ؛ ۲) آشوب و بلوا.

**گاف:** ناوی پیتێکی ئەلف‌و بێتکەیە ف حرف گاف.

**گاڤ:** ۱) دەم، کات، سات؛ ۲) شەقاو، قەدەم، هەنگاو ف ۱) گاه؛ ۲) گام.

**گاڤا:** لە دەمێکا، دەمێکی ف هنگامی.

**گاڤان:** ۱) شوانی گاران؛ ۲) پیاسەکردن، قەدەم‌لێدان ف ۱) گاوچران؛ ۲) قدم زدن.

**گاڤـانـــی:** ۱)کـــاری شوانــــی گاران؛ ۲) کرێی شوانــی گاران؛ ۳) عەشیرەتێکی گەورە لە کوردستان ف ۱) گاوچرانی؛ ۲) مزدگاوچران؛ ۳) نام عشیرەای بزرگ در کردستان.

**گاڤانێ:** ۱) جار و بار، چەل چەلە؛ ۲) هەنگاوبەهەنگاو ف ۱) گاهگاه، احیاناً؛ ۲) گام بە گام.

**گاڤبەر:** ۱) دوژمن؛ ۲) بەئێرەیی ف ۱) دشمن؛ ۲) حسود.

**گاڤ پیڤ:** بەهەنگاو پێوان ف باگام اندازە گرفتن.

**گاڤدان:** ۱) پیاسەکردن، قەدەم‌لێدان؛ ۲) دەرفەت‌پێدان ف ۱) قدم‌زدن؛ ۲) فرصت‌دادن، مهلت‌دادن.

**گاڤر:** ۱) فەلە، مەسیحی؛ ۲) ئاگرپەرەست، گەور؛ ۳) نەخوشیەکی گایە پێ‌دەفیرێنێ ف ۱) مسیحی؛ ۲) زرتشتی؛ ۳) از بیماریهای گاوی.

**گاڤگاڤ:** جاروبار، جارجار ف گاهگاە.

**گاڤەستی:** ئەومالانەی ناچنە هەوارو لە ئاران دەمێننەوە ف خانەهایی کە بە ییلاق نمی‌روند.

**گاڤەك:** ۱) شەقامێك؛ ۲) جارێ، هەلێ ف ۱) گامی؛ ۲) هنگامی.

**گاڤی:** نەهەمیشە، کاتی ف موقّتی.

**گاڤین:** ئەوپەڕی مەبەست ف منتهای مرام.

**گاڤڕ:** نەخۆشی گامردن ف مرگ و میر گاوها.

**گاقڕان:** گاقڕ ف مرگ و میر گاوها.

**گاقـوڕ:** ۱) گابوڕ؛ ۲) برێتی له مانگی سەرماوەز ف ۱) نگا: گابوڕ؛ ۲) کنایه از آذرماه.

**گاکۆتر:** کۆترەگایە، گاپڵ ف فاخته.

**گاکوچك:** گابەرد ف سنگ بزرگ.

**گاکوژ:** کێردی گەورەو دەبان ف کارد سلاّخی.

**گاکۆڤی:** گاکێوی، کەڵەکێوی ف گوزن.

**گاکۆڤی:** گاکوڤی ف گوزن.

**گاکێفی:** کەڵەکێوی ف گوزن.

**گاکێوی:** گاکێفی ف گوزن.

**گاگا:** جارجار ف گاه‌گاه.

**گاگایێ:** جارجارێ ف گاهگاهی.

**گاگروس:** پۆڵکە، گاگۆز ف گیاه خلر.

**گاگوُ:** ۱) ریخ، شیاکە، سەرین؛ ۲) برێتی له مرۆی ئەحمەق و هیچ نەزان ف ۱) سرگین؛ ۲) کنایه از آدم نفهم و جاهل.

**گاگوار:** گاگا ف گاه‌گدار.

**گاگوڕ:** ۱) قەبر بەگۆڕیچەوە؛ ۲) گۆڕیچە ف ۱) قبر و لحد باهم؛ ۲) لَحد.

**گاگۆز:** پۆڵکە ف گیاه خلر.

**گاگوس:** ترکی مەسیحی مەزەب ف تُرک‌زبان مسیحی.

**گاگۆڵکە:** ڕۆیشتن لەسەر دودەست و دوئەژنۆ ف لوکیدن.

**گاگۆڵکێ:** گاگۆڵکە ف لوکیدن، روی دست وزانوان راه‌رفتن.

**گاگۆڵە:** گاگۆڵکە ف لوکیدن.

**گاگوێ:** گیایەکی گەڵاپانە ف گیاهی است.

**گاگە:** کاکە ف نگا: کاکه.

**گاگەل:** گائەل ف رمهٔ‌گاو.

**گاگەلە:** گائەل ف رمهٔ گاو.

**گاگیر:** زەویەك کە گاسن‌گیری تێدابێ ف زمینی که گاوآهن در آن گیر کند.

**گاگێرە:** چێڵ و گا کە خەرمانیان پێ دەکوتن ف گاو خرمن کوب.

**گاڵ:** ۱) بەهــەراو هوریا ڕاونــان: (لێرە گاڵیاندا)؛ ۲) دەنگی زاروی ساوای تازە زمان‌گرتو: (هەر گاڵ و بوغیەتی)؛ ۳) هەرزنە تاڵە ف ۱) هوکردن؛ ۲) حرف‌زدن نوزاد؛ ۳) ارزن تلخ.

**گالا:** هێرش، هروژم ف یورش، هجوم.

**گاڵتــە:** ۱) قومـار، شۆخی؛ ۲) بازی، کایە؛ ۳) تیز ف ۱) شوخی؛ ۲) بازی؛ ۳) مسخره.

**گاڵتــەپێ‌کردن:** ۱) تیزپێ کردن؛ ۲) بازی بە لەیستۆك کردن ف ۱) مسخره‌کردن؛ ۲) بازی‌کردن با اسباب بازی.

**گاڵتەچی:** حەنەك‌بێژ، کەسێ قسەی سەیر دەکا بۆ پێکەنین ف لوده.

**گاڵتــەکــردن:** ۱) شۆخی‌کردن؛ ۲) بازی‌کردن، کایەکــردن ف ۱) شوخی‌کردن؛ ۲) بازی‌کردن.

**گاڵتین:** گاڵتین ف شوخی‌بازی.

**گاڵتێن:** بەحەنەك ئاخافتن ف شوخی‌بازی.

**گاڵدان:** ۱) دەرکردن بە هەراو هوریا؛ ۲) دنەدان، هانەدان ف ۱) دك و هو کردن؛ ۲) برانگیختن.

**گالر:** گوڵی زەمەق ف زنبق.

**گالش:** ژێرپیاڵە، ناڵبەکی ف نعلبکی.

**گاللۆر:** نێسکی بەلەك ف استخوان ساق.

**گاڵگـاڵی:** کولێرەی بەڕۆن و زەردێنەی هێلکە ف نوعی گردهٔ روغنی با زردهٔ تخم‌مرغ.

**گالو:** گاوان، شوانی گاڕان ف گاوچران.

**گاڵوبوغ:** دەنگ و قسەی زاڕوی ساواکە تازە زوان دەگرێ ف صدای کودکی که تازه به سخن آمده است.

**گاڵۆر:** قالۆر، لاسکەگیای ناوبەتاڵ ف ساقه گیاه کاوك.

**گاڵۆش:** کەوشی جیر ف گالُش.

**گاڵوُف:** گیایەکی دەشتیە ف از گیاهان صحرایی.

**گاڵوك:** ۱) تێلای ئەستوُر؛ ۲) مەساسەی دەستی جوت‌کەر ف ۱) چماق کلفت؛ ۲) غار شنگ.

**گاڵۆم:** کوتەکی سەرئەستوُر، گۆپاڵ، تۆپز ف چُماق.

**گاله:** خورجی بچوُك کە بەسەر شانیا دەدەن، هەگبەی‌پشت‌زین ف خورجین.

**گاڵە:** ۱) دەنگی پێکەنینی ساوا؛ ۲) دەنگی تێکەڵاوی باڵداری دەنگ خۆش؛ ۳) دادو هاوار بە ناڕەحەتی؛ ۴) ئازایەتی لە کاردا: (هەر **گاڵە** دەکا)؛ ۵) دەنگی هەور؛ ۶) داخستن: (درگا **گاڵە** دە) ف ۱) صدای خنـدهٔ نوزاد؛ ۲) صدای پرنده‌های خوش آواز؛ ۳) فریاد از غم؛ ۴) نشاط و چالاکی در کار؛ ۵) صدای رعد؛ ۶) بستن در و پنجره.

**گاڵەبەنگ:** گیایەکە بۆ دەرمان دەشێ ف گیاه گال‌بنگ، **قنطوریون**.

**گاڵەپێ‌کردن:** چاك وەخۆکەوتن لە کارێك: (چۆن دروێنەیەك هەر **گاڵەی پێ‌دەکا**) ف با کمال نشاط انجام دادن.

**گاڵەدان:** داخستنی دەرگاو پەنجەرە ف بستن در و پنجره.

**گاڵەکردن:** گاڵەپێ‌کردن ف بانشاط کار کردن، معرکه کردن.

**گاڵەگاڵ:** هەراهەرا ف سروصدا.

**گالەگورت:** پاش‌ملە خراوگوتن، غەیبەت ف غیبت گفتن.

**گالەگوڕی:** چەنەوەر، چەقەسرۆ ف وراّج.

**گاڵەوگیفە:** ترساندن بە قسە، هەڕەشە ف تهدید.

**گالێ:** گونـدێکی کوردستـانـە بەعسی کاولی کرد ف نام روستـایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**گالیسك:** ئامرازی دارکۆڵین ف ابزار کنده‌کاری چوب.

**گالیسکە:** کالیسکە، فایتوُن، دروشکە ف کالسکه.

**گالێش:** بارەگیای یەکسـەری، تەرمەکی گیا ف توده گیاهی که یك بار باربر است.

**گاڵـین:** ۱) گۆرانـی‌گوتن؛ ۲) ناڵانــدن؛ ۳) نانی هەرزن ف ۱) آواز خواندن؛ ۲) نالیدن؛ ۳) نان اَرزن.

**گاڵینە:** نانی هەرزن ف نانِ اَرزن.

**گژانـدن:** ۱) تێکـەڵ پێکەڵ کردن؛ ۲) برێتی لە ئاژاوەنانەوە ف ۱) درهم آمیختن؛ ۲) کنایه از آشوب بپاکردن.

**گژثاموك:** پرچی هۆندراو ف موی بافته.

**گژك:** ۱) کوژەکە؛ ۲) تەرزەی ورد؛ ۳) پرچی پەرژو بڵاو ف ۱) خرمُهره؛ ۲) تگرگ ریز؛ ۳) موی پریشان.

**گژکردن:** ۱) کزکردن، خۆلێك هەڵاندن؛ ۲) راست بوونەوەی موو ف ۱) توی هم رفتن؛ ۲) راست شدن مو.

**گژکن:** ۱) کەزی پڕ و زۆر؛ ۲) داری پڕلك وپۆپ ف ۱) موی پرپُشت و بسیار؛ ۲) درخت پُرشاخ و برگ.

**گژکه:** پۆکاوڵە، چەموڵە، چەمبوڵە ف ام کردن، پنجه گذاشتن.

**گژگـژ:** ۱) وشەی دنەدانی جوانەگا بۆ سەر چێڵی بەکەڵ، گژ، کەڵە؛ ۲) وشـك، زوا، زڕ، زوهـا؛ ۳) تێکـەوە هاویشتنی ئاپـۆرە ف ۱) کلمهٔ برانگیختن گاوگشن؛ ۲) خُشك؛ ۳) شلوغی و ازدحام مردم.

**گژگژاندن:** هانەدان بۆ شەڕ، دنەدان بۆ جەنگ ف تحریك کردن برای شروع جنگ.

**گژگژه:** پۆش و پەڵاشی بابردەڵە ف گیاه خشك بادآورده.

**گژگژەك:** بەفرخۆرکە، جۆرێ تەرزەی زۆرورد ف نوعی برف بسیار ریز.

**گژگژین:** راست بوونەوەی مو لە ترسان ف سیخ شدن موی بدن از شدّت ترس.

**گژل:** تەرزە، تەزرە، تەیرۆك ف تگرگ.

**گژلوك:** تەزروکە، تەرزەی ورد ف تگرگ ریز.

**گژم:** ۱) خەم، خەفەت؛ ۲) خەمبار؛ ۳) نەخۆشی تەنگەنەفەسی ف ۱) اندوه؛ ۲) دژم؛ ۳) نفس تنگی.

**گژن:** موی تێك هەڵاڵاو ف ژولیده.

**گژنەسەره:** سەرقژن ف ژولیده موی، پیچیده موی.

**گژنیز:** کشنیژ ف گشنیز.

**گژنێز:** گژنیژ ف گشنیز.

**گژنیزه:** ۱) گژلـوك، تەرزەی ورد؛ ۲) زبـری پێست لە سەرمـان؛ ۳) کشنیزه؛ ۴) کشنیژ ف ۱) تگرگ ریز؛ ۲) خشن شدن پوست از سرما؛ ۳) نوعی زیور؛ ۴) گشنیز.

**گژۆرەك:** وردە چرپی بۆ ئاڵاشی بان داپۆشین ف انبیره.

**گژوژ:** چلکن و قژن ف چرکین و ژولیده موی.

**گژوگیا:** پۆش و پار، روەك ف نباتات علفی.

**گژۆل:** جۆرێ داری جەنگەڵ ف از درختان جنگلی.

**گژۆله:** پەرژو بڵاو ف پراکنده وآشفته.

**گژۆلەك:** گێژەلۆکە ف گردباد.

**گژولی:** گژۆرەك ف انبیره.

**گژومژۆ:** تێکەڵ پێکەڵ، ناتەکوز ف درهم برهم و بی نظم.

**گژه:** ۱) دەنگی بای بەتـەوژم؛ ۲) گیایەکـە بۆ دەرمان دەشێ؛ ۳) دنەی جوانـەگا بۆ سەر مانگابەکەڵ ف ۱) صدای وزش تندباد؛ ۲) گیاهی است دارویی؛ ۳) کلمهٔ تحریك گشن بر ماده گاو.

**گژەبا:** بای توندی پایزی ف باد تند خزانی.

**گژه گژ:** گژەی با ف صدای تندباد.

**گژیان:** قرژبوونی مو، شێوانی مو ف آشفتن و ژولیدن موی.

**گژی بیێ:** گوندێکە لە کوردستان بە عسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**گس:** وشەی لێخوڕینی پەز، کس ف کلمهٔ راندن گوسفند.

**گست:** گوست، تیل،تلی، قامك، ئەنگوست، ئەنگوس ف انگشت.

**گسك:** جاڕو، گزك، گزگ ف جارو.

**گسكدان:** گزکدان ف جاروکردن.

**گسکدەر:** کەسێ کە بە گسك کار دەکا ف جاروزن.

**گسکه:** کسکە، بریقەی چاوی پشیلە لە تاریکیدا ف برق چشم گربه در تاریکی.

**گش:** گ، گژ، تێکڕا، هەمو ف همه.

**گشت:** ۱) بادراو، باوخواردو؛ ۲) گش، تێکڕا؛ ۳) قامك، ئەنگوس ف ۱) نخ تابیده؛ ۲) همه، همگی؛ ۳) انگشت.

**گشتائۆرتی:** قامکی ناوەڕاست ف انگشت وسطی.

**گشتاپلل:** تبلامەزن، قامکەگەورە ف انگشت شست.

**گشتاقلانج:** قامکەتوتە ف انگشت کوچکه.

**گشتامیانین:** گشتائۆرتی، زەڕنەقوتە ف انگشت وسطی.

**گشتـانـه:** ۱) ئەنگـوستیلە؛ ۲) قوچـەکـەی دورمـان؛ ۳) قولی درەو، ئەوەنـدەی لە دەستێکـا جێ دەبێتـەوە ف ۱) انگشتـر؛ ۲) انگشتانهٔ خیاطی؛ ۳) میزانی معادل یك کف دست.

**گشتر:** کلکەوانە، گشتانە ف انگشتر.

**گشتك:** ئەنگوتك ف چونه.

**گشتۆنه:** قوچەکەی دورمان ف انگشتانهٔ خیاطی.

**گشتەك:** بەنی گشت ف نخ تابیده.

**گشتی:** تێکڕایی، هەموانی ف همگانی، عمومی.

**گشـك:** ۱) تێکـڕا، گژ، گ، گشت؛ ۲) پۆکـاوڵە، چەموڵە؛ ۳) پەنجەی ناواڵەکراو؛ ۴) گژك، تەرزەی ورد ف ۱) همگی؛ ۲) ام کردن؛ ۳) پنجهٔ باز؛ ۴) تگرگ ریز.

**گشکه:** پۆکاوڵە، چەمبوڵە، گشك ف ام کردن.

**گغ:** دەنگێ کە لە منالی ساوا دەردەچێ ف صدای بچهٔ نوزاد.

**گغکی:** منالی گغ ویژ ف کودك چند ماهه، نوزاد.

**گغنی:** شلتاغ، تەشقەڵە، تەڵەکە ف شلتاق.

**گغه:** ۱) گغ: (زاروکەمان **گغە**و بقە دەکا)؛ ۲) بقە، وشەی ترساندنی ساوا ف ۱) نگا: گغ؛ ۲) کلمهٔ تحذیر از خطر برای کودك.

**گف:** ترساندن بەقسە: (هەڕو **گفم** لێ دەکا) ف تهدید.

**گفت:** پەیمان، بەڵێن ف قول و پیمان.

**گفتار:** قسە بۆخەڵك کردن ف سخنرانی، گفتار.

**گفتدان:** بەڵێن دان، پەیمان دان ف قول دادن.

**گفتوگۆ:** ئاخافتنی پێکەوە ف گفتگو.

**گفته:** گفت، بەڵێن ف قول.

**گفشك:** ۱) قورینج، قورینج گرتن؛ ۲) پۆکاوڵە، گشك، چەمبوڵە ف ۱)

نیشگون؛ ۲) ام‌کردن.

**گف:** ۱) گشتەك، بادراو؛ ۲) گف، ترساندن بەقسە؛ ۳) دەنگی بەردی هاویژراو بە قۆچەقانی: (هەر **گفەگفی** دێت) ف ۱) نخ تابیده؛ ۲) تهدید؛ ۳) صدای سنگ پرتاب شده با فلاخن.

**گفاشتن:** کوشین ف فشردن.

**گفاشگە:** جێگەی گوشینی ترێو...، گوشینگە ف جای فشردن میوه.

**گفالە:** کۆمەڵی چەکدار ف گروه تفنگداران.

**گفاند:** ۱) هێڵ، خەتی جوُت؛ ۲) خوارو خێچ ف ۱) شیار شخم زمین؛ ۲) کج و کوله.

**گفاندە:** ۱) سەرلێوی کەنداڵو شاخ؛ ۲) کەوشەنی زەمینی کێڵگە ف ۱) لبهٔ پرتگاه؛ ۲) مرز کشتگاه.

**گفر:** پشیلەی نێر ف گربهٔ نر.

**گفرت:** کێمو هەوا، جڵکی برین ف چرك و ریم زخم.

**گفردی:** لەرزین لەترسان، راچەنین ف لرزه از ترس، یکه‌خوردن.

**گفرك:** هەراش، ساوای بەکەیفو تەیار ف نموکرده، نوزاد شاداب.

**گفزۆنەك:** گیایەکی دەشتەکیە ف از گیاهان صحرایی.

**گفشك:** ۱) ئەنگوتکەهەویر؛ ۲) قورینج ف ۱) چونهٔ خمیر؛ ۲) نیشگون.

**گفقە:** ۱) گف، دەنگی بەردی بەرەقانی: ۲) دەنگی سوُڕانی خول‌خولەو مزراق ف ۱) صدای سنگ فلاخن؛ ۲) صدای چرخش شدید گردنا.

**گفکف:** گژەگژ ف صدای تُندباد.

**گفگفـە:** دارێکی جەغزی‌یە دو کونی تێکراوە بەنی تێ‌دەخەن‌و بای‌دەدەن گفەگفی لێ دێت ف نوعی فرفرهٔ چوبی.

**گفن:** موی تێك‌هاڵاوی گرژ ف موی ژولیده.

**گفۆردی:** گفردی ف چندش، یکه‌خوردن.

**گفـە:** ۱) گفقە؛ ۲) دەنگی بای بەقەوەت، گژە ف ۱) نگا: گفقە؛ ۲) صدای تند باد.

**گفەگف:** دەنگی گفەی لەسەریەك ف صدای پیاپی «گفه».

**گفی:** دەڵمەی پەنیر ف دَلمهٔ پنیر.

**گفێری:** ژان‌و برك ف دلپیچه.

**گفێرین:** عەزم‌کردن، هەڵتاواندن ف هضم خوراك.

**گفیشـك:** ۱) بلچ، گێوژ، گۆیژ؛ ۲) کوشراو، کوشراوی میوە ف ۱) زالزالك؛ ۲) عُصاره.

**گفین:** مەیین، بوُنەماست‌یان‌پەنیر ف بندآمدن شیر.

**گل:** ۱) ژانی چاو؛ ۲) جوُڵە، بزاو؛ ۳) خلۆر؛ ۴) خاکێ کە ژنان سەریانی پێ دەشۆن: ۵) جار، کەڕەت: ۶) راگرتن: (**گلم** داوەتەوە)؛ ۷) ترۆپکی چیا، دوندی کێو، نوُك کێف: ۸) سەرلق، لکی هەرەبڵندی دار؛ ۹) زیپکە ف ۱) چشم درد؛ ۲) حرکت؛ ۳) غلت؛ ۴) گِل سرشوی؛ ۵) بار، دفعه؛ ۶) نزد خود نگهداشتن؛ ۷) قُلّهٔ کوه؛ ۸) بلندترین شاخهٔ درخت؛ ۹) جوش پوست.

**گڵ:** ۱) خاك، خۆل؛ ۲) گڕ، بڵێسە: (**گڵبێنەی** تەندوُر) ف ۱) خاك؛ ۲) شعله، لهیب.

**گلا:** ۱) پەڕی، پەرت بو؛ ۲) گش‌لا، هەمولایەك؛ ۳) خلۆرەوەبو؛ ۴) پرچی وەهۆنـدراو؛ ۵) جارێك‌تر، هەلێکی‌کە ف ۱) پرت شد؛ ۲) همگی، همه جانب؛ ۳) غلتید؛ ۴) زلف تابیده؛ ۵) باردگر.

**گلابۆچ:** پرچی کورتی وەهۆنراو ف زُلف کوتاه آرایش شده.

**گلادە:** ۱) قەلادە، ئاڵقەی دەوری ئەستۆ؛ ۲) خشڵی ئەستۆ ف ۱) قلّاده؛ ۲) گردنبند.

**گلار:** ۱) چەمی بچـوُك؛ ۲) خلۆر: (لـەو سەرەوە **گلار** بوُمـەوە)؛ ۳) زڤرین؛ ۴) دەنکەترێ، لبەترێ؛ ۵) شۆڕبۆوە: (**گلارێ** بن‌چەنێ، واتا: بەرخەبەبە) ف ۱) رود کوچك؛ ۲) غلتان؛ ۳) برگرد، برگشت؛ ۴) دانه انگور، حبّه انگور؛ ۵) آویزان.

**گلاراو:** ۱) ئۆقرەنەگرتن، بێ‌قەراری؛ ۲) نەخۆشی ئەسپەك ف ۱) آرام نگرفتن؛ ۲) بیماری مالیخولیا.

**گلاراوێ:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**گلارکۆ:** ۱) گازر، قەسار؛ ۲) تێلای جلك‌و گەلاکوتان ف ۱) گازر؛ ۲) کدینه.

**گلارە:** ۱) بڕەداری لەسەریەك دانراو؛ ۲) دنکەترێ: (**گلارەترێ** وەدەمتا ناچێ)؛ ۳) گلێنە، بی‌بیلەی چاو ف ۱) قطعات هیزم برهم انباشته؛ ۲) حبّه‌انگور؛ ۳) مردمك چشم.

**گڵاز:** ۱) عەلوُکەسوُرەی پایزی، ئاڵو بخارا؛ ۲) ناوچەیەکە لە کوردستان ف ۱) آلوی قرمز؛ ۲) ناحیه‌ای در کردستان.

**گڵاس:** شەربەی شوُشە بۆ ئاوپێ‌خواردنەوە، پەرداغ ف لیوان شیشه‌ای.

**گڵاسی:** چەرمی نەرمی ڕەنگ‌کراو ف چرم ورنی.

**گلاف:** پیس، چەپەڵ ف کثیف.

**گلالە:** ئاڵۆ ف لوزتین.

**گڵاڵـە:** ۱) نیوەدروس‌بوُگ: (کـارەکـە **گڵاڵـە** بوە)؛ ۲) کەلابەردی لەچەرخ‌نەدراو ف ۱) نیم ساخته؛ ۲) تیلهٔ سنگی صاف نشده.

**گڵاڵـەکـردن:** ۱) نزیك بە تەواوبـوُن کردن؛ ۲) بیرکردنەوە لە کارێ‌و رێگەی دروست‌بوُنی دیتنەوە ف ۱) نیم ساخته‌کردن؛ ۲) زمینه‌چینی، طرّاحی.

**گلان:** ۱) بەسەررۆدا کەوتن: (ئەسپەکەم **گلا**)؛ ۲) پەرت‌بوُن: (لە ئەسپ **گلام**)؛ ۳) جوُڵان لە جێگە؛ ۴) خلۆربوُنەوە ف ۱) سکندری خوردن؛ ۲) پرت شدن؛ ۳) تکان خوردن؛ ۴) غلتیدن.

**گلانا:** دیسان، ئەم‌جارەش ف دوباره، باردگر.

**گلاندن:** ۱) خلۆرکردنەوە؛ ۲) جوُڵاندن؛ ۳) فڕێ‌دان؛ ۴) کۆکردنەوەی خواردنی لە ماڵان ف ۱) غلتانیدن؛ ۲) تکان دادن؛ ۳) پرت کردن؛ ۴) جمع کردن خوراك از منازل.

**گلانگ:** جار، چەل، دەحفە، دەحە ف دفعه، بار.

**گلانگا:** جاروبارە ف گاهگاه.

**گلانگی:** جارێك، کەڕەتێ،دەمێ‌ودەحفەیێ ف یك‌بار.

**گلانگینا:** جارێکی‌دیکە، دەحفەی‌تر ف باردگر.

**گلانن:** گلاندن ف نگا: گلاندن.

**گلاو:** ١) خلۆرەوەبوگ؛ ٢) پەڕیو لە بەرزی‌یەوە؛ ٣) بەسەر ڕۆدا کەفتك؛ ۴) گلاف ف ١) غلتیده؛ ٢) پرت شده؛ ٣) سکندری خورده؛ ۴) کثیف.

**گڵاو:** ١) قوڕاوی گڵەسوور؛ ٢) جێ‌دەمی سەگو بەراز؛ ٣) زۆر پیس؛ ۴) بریتی لە بنیادەمی بەدفەڕو بێ‌ئاکار ف ١) آب گل آلود؛ ٢) دهان زدهٔ سگ و خوك؛ ٣) پلید؛ ۴) کنایه از آدم بی اخلاق.

**گڵاوبوون:** چەپەڵبوون بە دەم‌لێدانی سەگو بەراز ف پلیدشدن با دهان سگ و خوك.

**گڵاوکردن:** شوتنی جێ‌دەمی سەگو بەراز بەقوڕاو جارێکو بەئاو شەش‌جار ف شستن دهان‌زدهٔ سگ و خوك با آب گل‌آلود و آب صاف.

**گلاوگل:** تلاوتل، ڕەت‌بردن ف تلوتلو.

**گڵاوی:** ١) پیسی لە دەمی سەگو بەرازەوە؛ ٢) بریتی لە بەدفەڕی‌و بێ‌ئاکاری ف ١) پلیدی از سگ و خوك؛ ٢) کنایه از بداخلاقی.

**گڵاوی کردن:** گڵاوکردن ف نگا: گلاوکردن.

**گلاهە:** ١) تالان، بوڕ؛ ٢) تالانکراو ف ١) غارت، چپاول؛ ٢) غارت شده.

**گڵاهەك:** ١) گزموڵەی ڕەق لە قوڕی دیزەو گۆزە کە بە جۆرە کەوانێك دەهاویژرا بۆ ڕاوەباڵندە؛ ٢) خوڵو قسڵی تێکەڵاو بۆ سواغ‌دان ف ١) مهرهٔ کمان گروهه؛ ٢) مخلوط خاك و آهك برای اندودن

**گلب:** گەرو، قورگ ف گلو.

**گل‌بوونەوە:** گلاربوونەوە، خلۆربوونەوە ف غلتیدن.

**گڵبێنە:** ١) گڕبەندی تەندوور؛ ٢) باکێشی تەندوور ف ١) بادکش بند تنور؛ ٢) بادکش تنور.

**گلپ:** ١) هەڵمەت، هێرش؛ ٢) پڕ پێداکردن‌و ڕفاندن ف ١) یورش، هجوم؛ ٢) قاپیدن.

**گلپۆچ:** کەزی وەهۆنراو ف زُلف تابداده.

**گڵپە:** ١) کڵپە، گڕی لەپڕ؛ ٢) دەنگی گڕگرتنی ئاگر ف ١) شعلهٔ یکهو پدیدآمده؛ ٢) صدای لهیب آتش.

**گڵپەگڵپ:** دەنگی لەسەریەکی گڕی ئاگر ف صدای پیاپی شعلهٔ آتش.

**گلتە:** ١) کێشەو هەرا، شەڕەقسە بەدەنگی بەرز؛ ٢) ڕاوەی نەخۆش ف ١) جدال لفظی؛ ٢) هذیان مریض.

**گلچژە:** تاقانەی دایکێ، تاکەمنداڵ لە دایکێك ف یکی یکدانه.

**گلخواردن:** ١) خلۆربوونەوە؛ ٢) بەدەورەدا گەڕان؛ ٣) مانەوە لەشوێنێك ف ١) غلتیدن؛ ٢) پیرامون گشتن؛ ٣) واماندن در جایی.

**گڵخواردن:** فێری خاك‌خواردن‌بوونی زارۆك ف خاك خوردن بچه.

**گلخواردنەوە:** مانەوە لەشوێنێك ف ماندن، از رفتن صرفنظر کردن.

**گڵخۆر:** زارۆی فێری خاك‌خواردن ف بچهٔ خاك خور.

**گڵخۆرکە:** کرمەسوورە، کرمی گڵ ف کرم خاکی.

**گلدان:** ١) جوڵاندن، تەکان‌پێ‌دان؛ ٢) جۆرێ ترێ سپیلکەی دەنك‌زل کە زووتر پێ‌دەگا ف ١) تکان دادن؛ ٢) نوعی انگور زودرس.

**گلدانەوە:** لای خۆ هێشتنەوە ف نزد خود نگهداشتن.

**گلدە:** ١) ببزوێنە، تەکان‌بدە؛ ٢) پرێسکە؛ ٣) گلتە ف ١) تکان بده؛ ٢) پیرزه؛ ٣) نگا: گلته.

**گلدی:** خلۆرەوەبوگ بەسەر زەمیندا، تلاوتل‌بوون ف غلت خوردن.

**گلدی کرن:** خلۆرکردنەوە، تلاوتل‌پێدان ف غلت دادن.

**گلزە:** باقە، باغە، دەسکێکی زل لە گیاو دەخل ف توده‌ای دسته شده از گیاه.

**گلسە:** بەزەمینداکەوتن ف بر زمین افتادن.

**گلفچ:** پشاوتن، لەناودەستا کوشران ف مچاله.

**گلفچاندن:** لەناودەستا کوشین ف مچاله‌کردن.

**گلفچین:** قرمچین، هەڵقرچان ف در اثر حرارت جمع شدن.

**گلفەرك:** ١) گروڵ؛ ٢) نێفەك ف ١) خشتك زیر بغل؛ ٢) خشتك تنبان.

**گلك:** ١) لاسکەگەنمەشامی بێ‌دەنك؛ ٢) گیایەکی بنك‌دارە؛ ٣) میتکە، بەلووکە ف ١) ساقهٔ بی‌دانهٔ بلال؛ ٢) گیاهی است؛ ٣) چوچوله.

**گڵکار:** بەنا، کەسێ کاری قوڕ دەکا ف بنّا.

**گڵکاری:** قوڕەکاری ف گلکاری.

**گلکردن:** وەژان‌کەوتنی چاو، چاوئێشان ف به دردآمدن چشم.

**گڵکۆ:** ١) گڵی بەسەریەکداکراو، کۆمای خاك؛ ٢) قەبر ف ١) تودهٔ خاك؛ ٢) قبر.

**گلکەردش:** پەرتاوتن، کەزاخە، لکی زیادی داپاچین ف هَرَس درخت.

**گڵکەن:** کانی گڵەدیزەو ئیر بار ف کان خاك رس.

**گڵکەند:** گڵکەن ف کان خاك رس.

**گلگل:** ١) تەتەڵەی دانەوێڵەو دەخڵ؛ ٢) هەرزنەگەورە؛ ٣) گیاگەسك ف ١) بوجاری؛ ٢) گارس؛ ٣) گیاهِ جارو.

**گلگلاندن:** تەتەڵەکردن ف بوجاری کردن.

**گڵگیر:** کەو، سەڕەند، سەڕەد ف سرند.

**گللارە:** گلارە، بۆڵوەترێ ف دانه انگور، حبّه انگور.

**گللك:** ١) زێدان، مناڵدان؛ ٢) کوز، قوز ف ١) زهدان؛ ٢) آلت تناسلی زن.

**گللی:** ڕەشکێنەی چاو، بیبیلەی چەم ف مردُمك چشم.

**گللێرە:** تەرزەی ورد ف تگرگ ریز.

**گللی کۆر:** کوێر ف نابینا.

**گلم:** لق، لك ف شاخهٔ درخت.

**گڵمت:** کەستەك، کڵۆگڵ ف کلوخ.

**گڵمتك:** گڵمت ف کلوخ.

**گڵنجان:** گڵکەن ف کان خاك رس.

**گلو:** ١) بۆڵ، بۆڵەترێ، گلارە؛ ٢) خڕی زۆر چکۆڵە لە ماست‌و شیری خراوبوودا: (شیرەکە خراو بوە **گلوگلو** بوە)؛ ٣) دانارداناربوونی سەمەنی‌و...: (**گلوگلو** وەستاوە) ف ١) دانه انگور، حبّه؛ ٢) اجزاء از هم گسستهٔ ریزی که در ماست یا شیر فاسد شده دیده می‌شود؛ ٣) دانه‌دانه‌شدن سمنو و...

**گلۆ:** ١) گش قەدێك، گشت چینێ؛ ٢) بۆچی، چما؟ ف ١) همهٔ لایه‌ها؛ ٢) چرا؟.

**گلواته:** ۱) قرپۆکی میوەی وشك وەك مێوژو هەنجیر و...؛ ۲) تڵپەی مێوژ ف ۱) مویز یا انجیر پوك و خشکیده؛ ۲) تفالهٔ مویز.

**گلواز:** ۱) رستەهەنجیری ئاڵقەکراو؛ ۲) ئاڵقەی بەخلەخل بە داری بێشکەوە ف ۱) انجیر خشك به رشته کشیدهٔ حلقه شده؛ ۲) اسباب‌بازی آویزان به گهواره.

**گڵواز:** جۆرێ بەری دارمازو ف نوعی ثمر مازوج.

**گڵوان:** بەرێکی دارمازوە بۆ دەباغ دەبێ ف نوعی ثمر مازوج.

**گڵۆت:** کەستەك، سندەگڵ ف کلوخ.

**گلوچاندن:** قرمچاندن، گڵۆفین، ژاکاندن لە ناو دەستا ف مچاله‌کردن، فشردن در دست.

**گلوخول:** چەرخ‌و خول، بزوتن‌و سوڕانەوە ف جنب وجوش.

**گڵوخۆڵ:** تۆزو غومار ف گردوغبار.

**گڵۆخە:** بەچکەمەلی خڕەکەو تازەپێ‌گەیشتوُ ف جوجه‌پرندهٔ تازه پر درآورده.

**گلودۆر:** بەدەورەدا هەڵخولان ف پیرامون گشتن.

**گڵۆر:** ۱) بازنە، بازن، خشڵی جومگەو باسك؛ ۲) گرۆڤەر؛ ۳) خلۆر؛ ۴) بەری هەردارێك کە وەك قۆزاخەبێ؛ ۵) جارێ لە جاران ف ۱) النگو؛ ۲) مدوّر، کروی یا دایره‌ای؛ ۳) غلتیده؛ ۴) هر ثمر غوزه‌مانند؛ ۵) وقتی از اوقات.

**گڵۆربوُنەوە:** خلۆربوُنەوە ف غلتیدن.

**گڵۆف:** بە دەست پشاوتن ف مچاله.

**گڵۆفین:** لە ناو دەستدا پشاوتن ف مچاله‌کردن.

**گڵۆڤەر:** گرۆڤەر، خڕ وەك هەنار یان وەك جەغز ف نگا: گرۆڤەر.

**گڵۆك:** ۱) ئەسپێ کە زۆر ڕەت دەباو بەسەردا دەکەوێ؛ ۲) بەسەر یەکاپێچراوی بەن ف ۱) اسبی که زیاد سکندری می‌خورد؛ ۲) گلولهٔ نخ.

**گلوگلو:** ۱) داناردانار؛ ۲) دەنکەدەنکە ترێ ف ۱) دانه‌دانه؛ ۲) دانه‌دانهٔ انگور.

**گل‌وگوێز:** ۱) ڕۆیشتن‌و هەستانی زۆر؛ ۲) خول‌خواردن‌و ئۆقرە نەگرتن ف ۱) جست وخیز؛ ۲) بی‌قراری، ناآرامی.

**گڵۆل:** ۱) گرۆر؛ ۲) خلۆر ف ۱) دانه‌ای انگل در گندمزار؛ ۲) غَلت.

**گڵۆلان:** ناوی دی‌یەکە ف نام روستایی است.

**گڵۆل بوُنەوە:** خلۆربوُنەوە ف غلت خوردن.

**گڵۆڵە:** ۱) بەنی لێك‌هالاوی خڕهەڵدراو؛ ۲) هەرشتێ خڕی لێك‌هالاو: (لەسەرمان خۆی **گڵۆڵە** کردبو) ف ۱) گلوله نخ؛ ۲) به هم پیچیده و درهم خزیده.

**گلولی:** دۆکەشك ف دوغ کشك.

**گڵۆلی:** گرۆڤەری وەك کەلا ف گرد کروی.

**گڵۆنگ:** دەحفە، جار، کەڕەت ف دفعه، بار.

**گلوەڕ:** گرۆڵی‌چۆغە ف خشتك زیر بغل.

**گڵوی:** قورگ، ئەستۆلەناوەوە ف گلو.

**گلوێز:** تف، ئاوی‌دەم ف آب دهان، خدو.

**گڵوێنە:** گڵبێنە ف نگا: گڵبێنە.

**گلە:** ۱) دەنکەترێی لە هێشو دارِناو؛ ۲) گازن، گازندە؛ ۳) پرچی وەهۆندراو ف ۱) دانه‌های انگور از خوشه ریخته؛ ۲) گله، گلایه؛ ۳) زُلف تابیده.

**گڵەئەرمەنی:** خاکێکی دەرمانە ف نوعی خاكِ دارویی، طین ارمنی.

**گڵەبان:** ئاخەبان، بانەناو ف خاك‌ریزی بام.

**گڵەبەرانە:** جۆرێ خاك بۆ ڕەنگ‌کردنی دەفری سواڵەتی ف نوعی خاك رنگی لعابی.

**گڵەجان:** ۱) کانی گڵی ئیربار؛ ۲) گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف ۱) معدن خاك رس؛ ۲) نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**گڵەجانی:** گڵەجان ف معدن خاك رس.

**گڵەحەرام:** خاکی قسڵ ف خاك آهك.

**گڵەخۆرکە:** کرمی گڵی، کرمەسوُرکە ف کرم خاکی.

**گڵەدۆشاو:** گڵێکی سپیە لە دۆشاوکردندا بەکاری دەهێنن ف خاکی که در شیره‌سازی به‌کار آید.

**گڵەڕەش:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**گڵەزەردە:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی درکردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**گڵەسپی:** خاکێکی چەرمگە سواغی ناوەوەی پێ‌دەکەن ف خاکی که به جای گچ برای اندودن دیوار به کار آید.

**گڵەسەر:** قورێکی زەردە ژنان سەری پێ‌دەشۆن ف گل سرشویه.

**گلەگلە:** دانەدانە، دەنکەدەنکە ف دانه‌دانه.

**گڵەمارە:** جۆرێ خاکی بۆری کەفەلۆك ف نوعی خاك خاکستری رنگِ سُست.

**گلەمەن:** بەگازندە، گازن‌کار ف گله‌مند.

**گلەمەند:** گلەمەن ف گله‌مند.

**گڵەنجان:** گڵەجان ف کان خاك رُس.

**گلەودان:** لای خۆ ڕاگرتن ف پیش خود نگاه داشتن.

**گڵەوەز:** کرێژی بەرد ف گل سنگ.

**گڵەهەرمەنی:** گڵەئەرمەنی ف نگا: گڵەئەرمەنی.

**گلەیی:** گلە، گازن، گازندە ف گلایه.

**گلی:** ۱) گلەیی، گازندە؛ ۲) شکایەت؛ ۳) قسە ف ۱) گلایه؛ ۲) شکایت؛ ۳) سخن.

**گلێ:** ۱) بازی لەسەر یەك‌پا ڕۆیشتن‌و پایەك بەرزکردن؛ ۲) یەك‌دەنك؛ ۳) گلەترێ، گلوی ترێ ف ۱) بازی لی‌لی؛ ۲) یك دانه؛ ۳) دانه‌انگور، حبّهٔ انگور.

**گڵی:** خاکی، لەخاك ف خاکی.

**گلیا:** ۱) بزوُت، تەکانی خوارد؛ ۲) بەسەر ڕودا کەوت؛ ۳) پەرت بو ف ۱) تکان خورد؛ ۲) سکندری خورد؛ ۳) پرت شد.

**گلیار:** شکۆفەی دارهەنار ف گل انار.

**گلیاز:** ١) گێلاس؛ ٢) بەلاڵوکەکێویلە [ف] ١) گیلاس؛ ٢) آلبالو کوهی.

**گلیاس:** گلیاز [ف] نگا: گلیاز.

**گلیان:** ١) بزوتن؛ ٢) تل بردن؛ ٣) خلۆر بونەوە [ف] ١) تکان خوردن؛ ٢) سکندری خوردن؛ ٣) غلتیدن.

**گلێجە:** قولکەی بەرسنگ، قولایی نێوان زگ‌و سنگ [ف] گودی میان سینه و شکم.

**گلێخە:** ١) گیایەکی بن‌زەردی سەرکەسکە بەچێشتی لێ‌دەنێن، گێلاخە؛ ٢) گەپلە [ف] ١) گیاهی است آشی؛ ٢) گیاهی است خوردنی.

**گلێر:** ١) لەدەوری یەك کۆبونەوە؛ ٢) خلۆر، گلار؛ ٣) تەرزە، گللێرە [ف] ١) دورهم جمع شدن؛ ٢) غلتان؛ ٣) تگرگ ریز.

**گلێران:** دەڵەکدان بۆ بزواندن‌و گلارکردنەوە [ف] هول دادن برای غلتاندن چیز سنگین.

**گلێربونەوە:** خلۆر بونەوە [ف] غلتیدن.

**گلێرکردنەوە:** خلۆرکردنەوە [ف] غلتانیدن.

**گلێرە:** گللێرە، تەرزەی ورد [ف] تگرگِ ریز.

**گلێرەوبون:** گلێر بونەوە [ف] غلتیدن.

**گلیز:** ئاوی دەم، لیك، لیکاو [ف] لعاب دهن.

**گلیزۆ:** کەسێ کە ئاوی دەمی بە ڕەخی دەمی‌دا دێتەخوار، لیکن [ف] کسی که همیشه لعاب دهانش سرازیر است.

**گلیزە:** چلورە، شوشەسەهۆڵ [ف] دنگاله.

**گلێژ:** لیکاو، ئاوی‌دەم، گلیز [ف] لعاب دهن.

**گلێژگین:** گلیزۆ، لیکن [ف] کسی که لعاب از دهنش جاری باشد.

**گلێژن:** گلیزۆ [ف] کسی که لعاب از دهنش جاری باشد.

**گلیش:** ١) شەقڵی خەرمان؛ ٢) پوش‌وپەلاش [ف] ١) مُهرگذاری بر خرمن؛ ٢) خس و خاشاك.

**گلیل:** درێژۆکەی گرۆفەر وەك داردۆزەنگ [ف] استوانه‌ای.

**گلیلە:** چلورە، گلیزە [ف] دنگاله.

**گلیم:** پەلاس، بەڕەی ساکار [ف] گلیم.

**گلێم:** گلیم [ف] گلیم.

**گڵێم:** گلیم [ف] گلیم.

**گلێن:** ١) خلۆرکەرەوە؛ ٢) دەڵەکدەر، پاڵ‌پێوەنەر [ف] ١) غلتاننده؛ ٢) تکان دهنده.

**گڵین:** لەگڵ‌چێکری، سواڵەت [ف] سفالی، گلی.

**گڵێنان:** ناوی گوندێکە [ف] نام دهی است.

**گڵێنجان:** گڵەجان [ف] کانِ خاك رُس.

**گلێنە:** ١) ڕەشکێنەی چاو؛ ٢) سپیایی‌و ڕەشایی چاو بەگشتی؛ ٣) کزن؛ ٤) گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد [ف] ١) مردمك چشم؛ ٢) کرهٔ چشم؛ ٣) گاودانه؛ ٤) نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**گڵێنە:** دەفری لەسواڵەت [ف] ظرف سفالی.

**گلێیی:** گلەیی [ف] گلایه.

**گم:** ١) نادیار؛ ٢) دەنگی کۆتر [ف] ١) گُم؛ ٢) صدای کبوتر.

**گماندن:** خوێندنی کۆتر [ف] آواز سردادن کبوتر.

**گمانن:** گماندن [ف] نگا: گماندن.

**گمایش:** ١) دەنگی گڕپەو بڵێسەی ئاگر؛ ٢) بەدەم‌قوچاوی بۆڵەبۆڵ کردن [ف] ١) صدای لهیب آتش؛ ٢) غرولند.

**گمبون:** نادیاربون [ف] گم شدن.

**گمڕە:** گومشك [ف] مدفوع موش.

**گمش:** ملانێ، زۆران، گولاش، زۆرەبانێ [ف] کُشتی.

**گمکردن:** نادیارکردن [ف] گم کردن.

**گم‌گم:** دەنگی گڕ و گڵپەی ئاگر [ف] صدای لهب آتش.

**گمگمۆك:** ١) تونگە، دەفری ئەستۆزراو بۆ تراو؛ ٢) خمخمۆك [ف] ١) تُنگ، سبوچهٔ گردن باریك؛ ٢) بُزمَچه.

**گمگمە:** ١) گمگمۆك؛ ٢) مەتارەی سەفەر بۆ ئاو؛ ٣) فینجانی قاوەخواردنەوە [ف] ١) تُنگ؛ ٢) قمقمهٔ آب؛ ٣) فنجان.

**گمە:** ١) دەنگی کۆتر؛ ٢) گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد [ف] ١) آواز کبوتر؛ ٢) نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**گمەگم:** دەنگی خوێندنی کۆتر [ف] آواز پیاپی کبوتر.

**گمی:** ١) ناخویایی، دیارنەبون؛ ٢) دەنگ‌دانەوەی چیا [ف] ١) گمی، گم بودن؛ ٢) انعکاس صوت در کوهستان.

**گمێز:** پێشاو، ئاوێ کە لە دەرونی زیندوەوە دەڕژێتە دەرەوە [ف] شاش، ادرار.

**گمێزدان:** جێگەی گمێز لە ناوزگ‌دا [ف] مثانه، آبدان.

**گمێزگیریان:** پێشاو قەتیس‌بون [ف] شاش‌بند.

**گمێزن:** کەسێ کە چرتکەمیزەی هەیە [ف] کسی که چکمیزك دارد.

**گمێزەچورتکێ:** چرتەمیزە [ف] چکمیزك.

**گمێزەچۆرتکێ:** چرتەمیزە [ف] چکمیزك.

**گمین:** ١) خوێندنی کۆتر؛ ٢) گرمەهاتن [ف] ١) آوای کبوتر؛ ٢) به گوش رسیدن صدای بم.

**گن:** ١) کەسێ کە لە قسەکردنا دەنگ لە کەپۆی دێ، کەسێ قسە لە ناوی کەپۆدا دەکا؛ ٢) نیوەتەزین‌و زورانەوەی پا، مێرولەکردن؛ ٣) پارچە، پاژ [ف] ١) کسی که غنّه در بینی دارد، کسی که تودماغی حرف می‌زند؛ ٢) مورمورکردن پا؛ ٣) قطعه، پارچه.

**گنا:** ١) گلۆڵە؛ ٢) شۆردن، بالاف [ف] ١) گلوله نخ؛ ٢) شستشو.

**گنار:** ١) ئەسپێ؛ ٢) زیندەوەری لەش؛ ٣) چڵکن‌و پیس، بۆ ئەندام دەگوترێ [ف] ١) شپش؛ ٢) جانورِ تن آدمی؛ ٣) چرکین و کثیف.

**گناس:** بێ‌ئاکار، پەست [ف] پست فطرت.

**گنایش‌وارۆ:** کەفتن بە زەمینا [ف] بر زمین افتادن.

**گنایەنە:** وێك کەوتن [ف] بەهم خوردن.

**گنایەنەوارۆ:** کەفت بە زەمینا [ف] بر زمین افتاد.

**گنتەڵ:** کورتی قەڵەو [ف] کوتاه‌قدّ چاق.

**گنج:** ١) چرچ: (گنج کەفتۆسە توێڵی)؛ ٢) بەرگ‌و جلك؛ ٣) کنج [ف] ١) کیس، چین وچروك؛ ٢) لباس؛ ٣) نیم‌تنه.

**گنجڕ:** ونجڕ، شڕوشڕۆڵ، بەتیتۆڵ‌و بزگوڕ [ف] پاره‌پاره و وصله‌زد

**گنجی:** ١) شتی چرچو چینـدار؛ ٢) کەمێڵی پەز [ف] ١) چین وچـروك خورده؛ ٢) پوستگاله.

**گنچك:** کەمێڵ، گنجی [ف] پوستگاله.

**گنخ:** بۆنێ که لە تەڕشوحەوە توشی خواردەمەنی دەبێ [ف] بوی گنداز نم.

**گنخاو:** بۆن گرتو [ف] بوگرفته.

**گندا:** گنا [ف] نگا: گنا.

**گندر:** خلۆر، گلۆر [ف] غلت.

**گندڕ:** ١) باگردێن؛ ٢) ڕوُخان [ف] ١) بام غلتك؛ ٢) فروریختن دیوار.

**گندراندن:** تلارکردنەوە، خلۆرکردنەوە [ف] غلتانیدن.

**گندرایش:** خلۆربوُنەوە [ف] غلتیدن.

**گندڕین:** داڕوُخان [ف] فروریختن دیوار و کوه.

**گندز:** چاوەنۆڕی دەرفەت، خەفتان [ف] منتظر فرصت.

**گندك:** ١) ئەنگوتك؛ ٢) تەپۆڵکەی پچوُك [ف] ١) چونه؛ ٢) تپۀ کوچك.

**گنـــدۆر:** ١) کاڵـەك، قارپـوز؛ ٢) دۆریە، گیایەکی باڵابـەرزە لاسکی شیرینە، قەلەندۆر [ف] ١) خربزه؛ ٢) گیاهی ساقه شیرین است.

**گندۆڕ:** گندۆر [ف] نگا: گندۆر.

**گندۆره:** گندۆر [ف] نگا: گندۆر.

**گندۆڕه:** گندۆر [ف] نگا: گندۆر.

**گندۆش:** سوُزن، شوُزن، کوندوش [ف] جوالدوز.

**گندۆلەك:** خڕوەك گۆ، وەك تۆپی بازی [ف] گِرد، کروی.

**گنگنك:** گنگنۆك [ف] نگا: گنگنۆك.

**گنگن:** پاژپاژ، پارچەپارچە [ف] قطعه‌قطعه.

**گنگنۆك:** بنیادەمی گن [ف] کسی که غنّه در بینی دارد.

**گنۆڕ:** دۆریە، قەلەندۆر، گندۆر [ف] گیاهی است، نگا: گندۆر.

**گنۆیی:** زگ‌لەوەڕێن، چەورە، چلێس [ف] شکمو.

**گنـه:** ١) قسـەکردن لە کەپۆدا؛ ٢) کاورای گن [ف] ١) تودماغی سخن گفتن؛ ٢) یاروی «گن».

**گنهوُر:** بنەگیایەکە وەك شێلم دەیخۆن [ف] گیاهی است شلغم مانند.

**گنی:** ١) حاڵی گن، قسە دەناو کەپۆدا گوتن؛ ٢) موُی گرژ؛ ٣) پێویستە، ئەشێ بوێ [ف] ١) تودمـــاغی سخن گفتن؛ ٢) ژولیدگی مو؛ ٣) لازم است، ضرورت دارد.

**گنیخه:** کۆتەرەی ئەستۆ، ئەستوُرایی ئەستۆ [ف] قطر گردن.

**گنێخه:** بنیادەمی ئەستۆئەستوُر [ف] آدم گردن کلفت.

**گنین:** ١) گن قسـەکردن؛ ٢) کەوتن بە زەویدا [ف] ١) تودماغی سخن گفتن؛ ٢) افتادن.

**گۆ:** ١) ئەنـدامی بیستن؛ ٢) ئاخـافتن: (گفتو گۆ)؛ ٣) تۆپی دارینی کاشـۆبـازی؛ ٤) دوگمە، پشکۆژ؛ ٥) هەرشتی گردیلەی چکۆڵە؛ ٦) هەستو پێزانینی ئەندام: (دەستم **گۆ** ناکا لەسەرمان، زمانم **گۆ** ناکا)؛ ٧) چیچکی گوانو مەمـك: (**گۆی مەمك**)؛ ٨) سەرەعاسای خڕ؛ ٩) سەری کێر ئەوەنـدی گۆشتی دیارە؛ ١٠) گاو چێڵ؛ ١١) کۆ، پڕایی خەڵـك: (**گۆبەند، گۆڤەند**)؛ ١٢) شەنەی سێددانە [ف] ١) گوش؛ ٢) گفتـار؛ ٣) گوی بازی؛ ٤) دکمـه؛ ٥) هرچیز کوچـك گرد؛ ٦) تاب حرکت، حس؛ ٧) نوك پستان؛ ٨) گوی سرعصا؛ ٩) سرِ ذکر؛ ١٠) گاو؛ ١١) اجتماع مردم؛ ١٢) افشون سه‌شاخه.

**گوُ:** ١) تڵتەی خۆراك کە لە قنگەوە دەردەچێ؛ ٢) ئەندامی بیستن: (تە **گوُ** لێیە ئەز چدبێژم) [ف] ١) مدفوع؛ ٢) گوش.

**گوار:** بازەکەو، بەچکەکەو [ف] جوجه کبك.

**گوارا:** ڕەوان، بێ گیرکردن [ف] ضدگیرا، گوارا.

**گواران:** گونـدێکی کوردستـانە بەعسی کاولی کرد [ف] نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**گوارده:** جۆرێ خواردنی لە شیر [ف] یکی از مشتقّات شیر.

**گواره:** ١) خشڵێ کە دەگۆ دەکرێ؛ ٢) هەرشتێ لە گوێوە شۆڕ بوُبێتەوە: (بزنی بە**گواره**) [ف] ١) گوشواره؛ ٢) هرچیز آویزان از گوش.

**گواز:** ڕاگوێز، لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێ بران [ف] انتقال.

**گوازتن:** ڕاگوێزتن، لە شوێنێ بۆ شوێنێ‌تر بردن [ف] نقل کردن، انتقال دادن.

**گوازتنەوه:** گوازتن [ف] انتقال دادن.

**گواستن:** گوازتن [ف] انتقال دادن.

**گواستنەوه:** گوازتن [ف] انتقال دادن.

**گواسن:** خڵتەو تڵتەی وشکەوەبوی ئاسن [ف] چرك کتله شدۀ آهن.

**گواشتن:** گڤاشتن، کوشین [ف] فشردن.

**گواڵه:** جەواڵ [ف] جوال.

**گوان:** ١) جێگـــەی شیری ئاژەڵی شیردەر؛ ٢) نەرمبوُن بە کوشین بە دەست: (**گواندم**) [ف] ١) پستان حیوان؛ ٢) نرم شدن در اثر فشردن با دست.

**گواندن:** شلو نەرمکردن بە کوشین [ف] نرم کردن با فشردن.

**گوانـدێڵ:** کەسێ مەمکی زلو داچـۆڕاو بێ [ف] کسی که دارای پستان بزرگ و آویزان باشد.

**گواندێن:** دوڕ ڕان، جێگەی گوان، گەلی حەیوانی بەگوان [ف] میان ران پستاندار.

**گوان کردن:** زلبوُنـی بنـی گوانـی ئاژەڵـی ئاوس [ف] بزرگ شدن بیخ پستان حیوان آبستن.

**گواو:** ١) شلو نەرمبوُگ لە کوشین: (مەمکیان هێند کوشیوە **گواوه**، ئەم بەهێیە بە دەست **بگوێنه**)؛ ٢) ئاوی تێکەڵ بە پیسایی [ف] ١) نرم شده از فشردن؛ ٢) فاضلاب.

**گوتەستێره:** ئەستێرۆك، کرمێ کە بە شەو دەتروسکێ [ف] کرم شبتاب.

**گوایا:** ١) دەڵێن، وامبیستوە؛ ٢) ئەدی، چما: (**گوایا** بۆکوێ دەچی؟) [ف] ١) گویا؛ ٢) مگر.

**گوایه:** گوایا [ف] نگا: گوایا.

**گوب:** بۆشایی نێوان کاکیلە [ف] لپ.

**گۆباره:** گاگەل، ڕەوەی گاوگامێش [ف] گلۀ گاو و گاومیش.

**گوبـاز:** گونـدێکی کوردستـانە بەعسی کاولی کرد [ف] نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**گۆبازی:** گاڵتەو کایەی کاشۆبازی [ف] چوگان بازی.

**گوبجڕ:** بۆشایی زار پڕلەپف کردنو بەمست لێدان ف لپ پراز باد کردن و با مشت زدن.

**گۆبــردن:** ١) سەری سیرەت خستنـە نـاوزێوە؛ ٢) گۆ لە کاشۆ بازیدا ڕفاندن ف ١) سر ذکر در فرج بردن؛ ٢) گوی از میدان در بردن.

**گۆبردنەوە:** ١) سەرکەوتن لە کاشۆ بازیدا؛ ٢) بریتی لە پێش‌کەوتن لە هەوالان ف ١) گوی از میدان به دربردن؛ ٢) کنایه از سرامد بودن.

**گۆبۆق:** قەوزەی وردی سەر ئاو ف خزهٔ نرم.

**گۆبەخۆداکردن:** ١) بەخۆدازیان؛ ٢) بریتی لە کار بەخراپی کردن ف ١) برخود ریدن؛ ٢) کنایه از بی‌هنری در انجام کار.

**گۆبەروك:** ریزەدوگمەی زێڕو زیو کەلە پێسیر دەدرێ ف گوی زینتی بر گریبان.

**گۆبەل:** ١) گوێ‌قیت، گوێ‌قوت؛ ٢) بریتی لە مرۆی لەسەرهەست ف ١) برجسته گوش؛ ٢) کنایه از حسّاس و تیزگوش درشنیدن.

**گۆبەل کردن:** بریتی لە کوڵە کردن ف کنایه از تجسّس و استراق سمع.

**گۆبەلە:** بەلەباقە ف یکی از بیماریهای بُز.

**گۆبــەن:** ١) رستـەی گۆی خشـل؛ ٢) کۆبـوونەوە بۆ بەزمو شادی؛ ٣) کێشـەو ئاژاوە ف ١) گوی‌بنـد گریبـان؛ ٢) همایش برای سرور و شادی؛ ٣) آشوب.

**گۆبەند:** گۆبەن ف نگا: گۆبەن.

**گۆبەندگێڕ:** ١) قامبێژی داوەتو بەزم؛ ٢) ئاژاوەچی ف ١) خُنیاگر؛ ٢) آشوبگر.

**گۆبەندگێڕان:** کاری گۆبەندگێڕ ف ١) خُنیاگری؛ ٢) آشوبگری.

**گوپ:** ١) لە بەرزیەوە بازدان؛ ٢) جێگـەی پەنەماو لە دارکاریدا ف ١) شیرجه بردن؛ ٢) جای ورم کرده در اثر چوبکاری.

**گوُپ:** ١) گوُپ، بۆشایی لاشەویلاکە؛ ٢) ئاوساندنی گوُپ بەپف ف ١) لپ؛ ٢) باد در دهان کردن.

**گۆپار:** کۆپار ف ١) چوگان؛ ٢) عصا.

**گۆپارە:** کۆپار، گۆپار ف نگا: گۆپار.

**گۆپــاڵ:** ١) داردەستی ئەستوور؛ ٢) داردەستی سەرچەماو ف ١) چماق سرگنده؛ ٢) چوگان.

**گۆپاڵ باران:** بارانی زۆر بەتەوژمو دەنك‌زل ف رگبار شدید باران.

**گۆپــاڵــە:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**گوپتەپە:** ناوی دوگوندی کوردستانە کە بەعسی وێرانی کردن ف نام دو روستای کردستان که بعثیان ویران کردند.

**گوپچڕ:** ١) گوبجڕ؛ ٢) بەپرتکەپرتکە ڕیان؛ ٣) زەحمەتو دژواری ف ١) برلُپ پر بادزدن؛ ٢) کم کم ریدن؛ ٣) دشواری، زحمت.

**گوپچـڕگوپچڕ:** زۆر دژوار: (**بەگوپچڕگوپچڕ** گیرم کەوت) ف زحمت و دشواری بسیار.

**گۆپچــە:** گونـدێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**گۆپك:** ١) سەرچلۆی دار؛ ٢) ترۆپکی چیا؛ ٣) خونچەی شکۆفەدار؛ ٤) سەری هەر شتێ درێژ کە خڕ بێ ف ١) بالاترین نقطهٔ درخت؛ ٢) قلّهٔ کوه؛ ٣) تژهٔ درخت؛ ٤) سر هر چیز بلند که گرد باشد.

**گۆپکە:** گۆپك ف نگا: گۆپك.

**گوُپ گوشاد:** بریتی لە زارزل ف کنایه از دهن فراخ.

**گوُپن:** بنیادەمی گوُپ‌زۆپ ف آدم لُپ برجسته.

**گوُپنە:** گوُپن ف نگا: گوُپن.

**گۆپۆ:** زەلامی زەبەلاح و ناقوڵا ف لندهور.

**گوُپەزنێ:** ڕووُنینەوە ف رخسار با ناخن خراشیدن.

**گۆپێ:** بریتی لە بەلێنی بێ‌کردار ف کنایه از قول بی‌عمل.

**گۆپیتــە:** ١) تازەدەرهاتوی لكو گیاو سەوزە؛ ٢) گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف ١) شاخه و گیاه تازه دمیده؛ ٢) نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**گوُپێ‌خوران:** بریتی لە پەشیمـانی لە کارێ کە ئاکامی باش نەبوە ف کنایه از پشیمانی از کار بدفرجام.

**گوُپێ‌خوراو:** بریتی لە کەسێ کە لە کاری خراپی خۆی پەشیمان بێ ف کنایه از آدم پشیمان از کار بدخود.

**گوُپێ‌خوراوبوُن:** گوُپێ‌خوران ف نگا: گوُپێ‌خوران.

**گۆپیلانك:** گۆپیتە ف نگا: گۆپیتە.

**گۆت:** ١) لەپێ‌کەوتن لەبەر ماندویی: (**گۆت** بوُم ئەوەندە ڕۆیشتم)؛ ٢) کوت، حینچکە؛ ٣) بزوتن و جوڵانەوە؛ ٤) رابردوی گوتن، گوتی ف ١) بی حرکت از خستگی؛ ٢) کلەزدن در جماع؛ ٣) تکان و جنبش؛ ٤) گفت، ماضی گفتن.

**گۆتار:** ١) وتار؛ ٢) شەرمی سەربەمۆری ژن ف ١) سخنرانی؛ ٢) آلت تناسلی بکر دوشیزه.

**گۆتاڵ:** ١) شلتاخ، دەبە؛ ٢) ئاژاوەو پشێوی؛ ٣) شوُمو جوت‌قۆشە؛ ٤) پاتاڵ و ماڵات: (گاو **گۆتاڵ** خۆمان هەس) ف ١) شلتاق؛ ٢) آشوب؛ ٣) نحس؛ ٤) دام غیر از گوسفند و بز.

**گۆتاوەرۆ:** کێشەو ئاژاوە، پشێوی ف آشوب و هنگامه.

**گۆتبوُن:** لەپێ‌کەوتن لە ڕێ‌ڕۆیشتنی زۆر ف از پا افتادن از فرط خستگی.

**گۆت‌دان:** بزواندن، دەڵەکدان ف تکان دادن.

**گۆتر:** کۆتر، کەموتەر، کەفۆك ف کبوتر.

**گۆتــرگــە:** گیایـەکی لاسـك‌ئەسـتوُری سـەرپڕلـەدڕکـە ف گیاهـی اسـت خاردار.

**گۆترمە:** بێ کێشانەو پێوانە خەملاندن ف تخمین بدون اندازه‌گیری.

**گۆترە:** گۆترمە ف نگا: گۆترمە.

**گۆترە کاری:** بریتی لە کاری بیرلێ‌نەکراو ف کنایه از کار نسنجیده.

**گۆترە کان:** دەم‌کردنەوەی خونچەی دار ف سر باز کردن شکوفه.

**گۆترە کین:** گۆترەکان ف نگا: گۆترەکان.

**گوتك:** ئەنگوتکەهەویر، گونکەهەویر ف چونهٔ خمیر.

**گوُتك:** گیایەکە مرۆ دەیخوا ف گیاهی است خوردنی.

**گوتل:** تۆلا، شتی زۆروردی پێکەوە لکاو ف ذرّات ریز به هم چسبیده.

**گوتله:** گوتل ف ذرّات ریز به هم چسبیده.

**گۆتلێدان:** کوت‌پێوەدان ف کله‌زدن در جماع.

**گوتن:** ۱) قسەکردن، بێژتن؛ ۲) برێتی لە ئاوازخوێندن ف ۱) گفتن؛ ۲) کنایه از آواز خواندن.

**گۆتن:** گوتن ف نگا: گوتن.

**گوتۆ:** ئیشاعە، قسەی ناوخەڵك بێ ئەوە ڕاست بێ ف شایعه.

**گوتۆخ:** بێژەر، کەسێ کە قسە بۆ خەڵك دەکا ف سُخنران.

**گوتە:** ۱) قسە، بێژە، بێژراو؛ ۲) ئیشاعە، شایەعە ف ۱) گفته؛ ۲) شایعه.

**گۆتـە:** ۱) گوتـە، ئیشاعە؛ ۲) گاڵتەی حەمزەل ف ۱) شایعه؛ ۲) بازی پرش بر پشت همدیگر.

**گۆتەکە:** کایەی حەمزەل ف بازی پرش بر پشت خمیدهٔ همدیگر.

**گۆتەگۆت:** ئیشاعە، گوتەی خەڵك ف شایعه.

**گوتـەنی:** ۱) شیاوی گوتن؛ ۲) وەك دەڵێ. (کـوردە **گوتـەنی**) ف ۱) گفتنی، سزاوار گفتن؛ ۲) چنانکه گوید.

**گۆتەنی:** گوتەنی ف نگا: گوتەنی.

**گوتی:** وتی، ئاخافت ف گُفت.

**گۆتی:** ۱) بێژە، قسیە؛ ۲) وتی، قسەی کرد ف ۱) گفتار؛ ۲) گفت.

**گۆتێ کردن:** برێتی لە کارتێك‌دان‌و خەراپ‌کردن ف کنایه از به هم زدن و خراب کردن کار.

**گۆج:** دەست‌و پای چەفت‌و چەوێڵ ف دست و پای ناقص.

**گۆجْ:** زۆری، زوڵم: (ئەم باجە ئیتر **گۆجە** بەسەرمان داسەپاوە) ف ناروا، ظلم.

**گۆجاگ:** بشکۆك، قۆبچە، دوگمە ف دُکمه.

**گۆجك:** جاش‌باڵتە، پاڵتۆی تابشت ئەژنۆ ف پالتو کوتاه.

**گوجو:** پێسیری کراس ف یقهٔ پیراهن.

**گوجوُك:** گجوُك ف توله‌سگ.

**گۆجە:** بەندی‌بەرۆك ف بند یقه.

**گوجەدڵ:** برێتی لە عەولاد ف کنایه از اولاد.

**گوجەر:** کزو داڵگۆشت‌و بێ‌هێز ف لاغر.

**گوجی:** ۱) گوجو؛ ۲) گجوُك ف ۱) یقهٔ پیراهن؛ ۲) توله‌سگ.

**گۆجی:** ۱) گوج، یەکـەم‌شیر؛ ۲) دەست‌وپـا چەوێڵی ف ۱) آغوز؛ ۲) نقصان دست و پا.

**گوجیله:** بێچوی ساوای سەگ ف نوزادِ سگ.

**گوچ:** ۱) ژەك، فرچك، یەکەم‌شیر؛ ۲) پەنەمان لەزەبر ف ۱) آغوز؛ ۲) آماسیدن از ضر به‌خوردن.

**گۆچ:** بەدەن بە چەوری یان هەر شتێ دامـاڵین ف چر بی یا دیگر مواد به‌تن مالیدن.

**گوُچ:** قوژبن، سوُچ، گۆشە ف گوشه، زاویه.

**گۆچـان:** ۱) داردەستی سەرچـەماو؛ ۲) گۆپاڵ، کۆپاڵ ف ۱) چوگان، عصا؛ ۲) چماق سرگنده.

**گوچك:** ۱) گۆچك؛ ۲) پجوُك ف ۱) گوش؛ ۲) کوچك.

**گۆچك:** گوێ، گوُ، ئەندامی بیستن ف گوش.

**گۆچکردن:** فرچك‌دان، ژەك‌دان بە ساوا ف آغوز به نوزاددادن.

**گۆچکـردن:** ئەندامی زارۆ بە ڕۆن چەورکردن‌و داماڵین ف تن نوزاد به روغن اندودن و ماساژدادن.

**گۆچوُن:** تەزین‌و لەکارکەوتنی ئەندام: (دەستم **گۆچوە**، زمانم **گۆچوە**) ف کرخ و بی حس شدن اعضاء.

**گۆچەری:** کۆچەری، خێلاتی، ڕەوەند ف کوچ کننده به ییلاق.

**گۆچەل:** گۆپاڵ، گۆچان ف عصا.

**گۆچەوەن:** شوُژن، سوُژن ف جوالدوز.

**گوچیلك:** گورچیلە ف کلیه، گرده.

**گوُخارن:** برێتی لە پەشیمانی، گوُپێ‌خوران ف کنایه از پشیمانی.

**گۆخڵ:** زانا لە چەڵتوُك‌چاندندا ف خبره در شالیکاری.

**گۆخلانە:** کـرێی زانـاو پسپۆری برنجـەجاڕ ف مـزد آدم خبـره در شالیکاری.

**گوُخلێنە:** قالۆنچەی ڕێخ‌گلێن ف سرگین غلتان، جُعَل.

**گوُخواردن:** گوُخارن، گوُپێ‌خوران ف کنایه از پشیمانی.

**گوُخوارن:** گوُخواردن ف کنایه از پشیمانی.

**گود:** ۱) خڕ، گروڤـەر؛ ۲) ئەنگوتکی هەویر؛ ۳) کوتکی گران‌و زل؛ ۴) تۆپی گەمە ف ۱) کروی؛ ۲) چونه؛ ۳) چماق؛ ۴) توپ بازی.

**گۆد:** پاسست‌بوُن لە سواری زۆر ف سست شدن پا از سواری بسیار.

**گوداڤەوری:** تۆپی‌بەفر، تۆپەڵە ف گلوله‌برف.

**گودامیری:** ئەنگوتکی‌هەویر ف چونهٔ خمیر.

**گودروُن:** ۱) پارچـەیەکی قومـاشە؛ ۲) ناوە بۆ پیاوان ف ۱) پارچه‌ای است؛ ۲) نام مردانه.

**گودوُك:** تازەلاو، نوجوان، لاوك، لاوکۆ ف بُرنا.

**گودە:** کەلوُی پەموُ ف پاغند، وش.

**گۆدە:** لەشی مرۆ ف جسم آدمی.

**گۆدەك:** پیزە، تۆل، پز، پس ف جنین.

**گۆدەگۆد:** سەرڕاژاندنی منداڵ ف سر تکان دادن کودك.

**گۆدەڵـە:** گۆبەرۆك، خشڵێ کە بە کەنارەی کولەجەوە دەدروێ ف زیور کنارهٔ یلك.

**گۆدەڵەکە:** گۆدەڵە ف نگا: گۆدەڵە.

**گوڕ:** ۱) توان‌و تاقـەت؛ ۲) خوڕین‌و گرمە: (مە**گوڕێنە** سەبر قسەبکە)؛ ۳) گڕی ئاگر، بڵێسە؛ ۴) ترساندن بەقسە؛ ۵) هاتنەخواری بەتەوژم: (گـوڕگوڕ فرمێسکی دەهاتەخوارێ)، خوڕ؛ ۶) داوەبەنێ کە دەخرێتە پای مەل؛ ۷) بەخڕی ڕۆیشتن ف ۱) قوّت، نیرو؛ ۲) غرش؛ ۳) زبانهٔ آتش؛ ۴) تهدید؛ ۵) با شتاب سرازیر شدن؛ ۶) ریسمانی که به پای پرنده بندند؛ ۷) **همه باهم رفتن.**

**گور:** ۱) دڕنـدەی بەنـاوبـانگ کە دوژمنی هەستەسەری پەزە، گورگ، شینـۆ؛ ۲) قەراغی کەوش؛ ۳) کۆبـوُنەوە؛ ۴) لەپێست دەرهێنان؛ ۵) سەربـڕین ف ۱) گرگ؛ ۲) لبهٔ کفش؛ ۳) گردهمایی؛ ۴) از پوست درآوردن؛ ۵) سر بریدن.

**گۆر:** وەك، چەشن، لەوێنە، جۆر ف مانند، طور.

**گۆڕ:** ١) خەرگۆڕ، کەرەکێوی؛ ٢) تەختوڕاست؛ ٣) سزا، جزیا: (**گۆڕی** گیانت بێ)؛ ۴) قەبر، گڵکۆ؛ ۵) بەردەم، ناو کۆڕ: (قسەکەم خستە **گۆڕ**، سێوەکانی لەو **گۆڕە** ڕۆکرد)؛ ۶) شت لە جێگەی شتێ: (ئاڵوگۆڕ) ف ١) گورخر؛ ٢) هموار؛ ٣) جزا؛ ۴) قبر؛ ۵) صحنۀ مجلس؛ ۶) عوض.

**گوُر:** بێچوی چێڵ ف گوساله.

**گۆڕابـــۆزا:** لەو گوندانـەی کوردستـانـە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی درکردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**گوُراسن:** ١) گواسن؛ ٢) خوڵەکەوەی پێکەوەلکاوی ڕەق لە تەندوُردا ف ١) نگا: گواسن؛ ٢) خاکستر به هم چسبیدۀ سفت.

**گوراش:** گولاش، زۆران، ملانێ، عەفرە، زۆرەوانێ ف کُشتی.

**گوران:** ١) لەپێست دەرهاتن؛ ٢) سەربڕان؛ ٣) چەند شینۆ، چەند گور؛ ۴) کاملْبوُن، پێگەیشتن ف ١) غلفتی، ازپوست خارج شدن؛ ٢) سر بریده شدن؛ ٣) گرگها؛ ۴) تکامل یافتن.

**گوڕان:** به دەنگی قەو گوتن ف غریدن.

**گۆران:** ١) تیرەیەکی زۆر گەورە لە کورد؛ ٢) دێهاتی، ڕەعیەت؛ ٣) ڕێگر، چەتە؛ ۴) سەربە تیرەی گۆران؛ ۵) لەوەڕگە؛ ۶) نازناوی هەستیارێکی هاوچەرخە؛ ٧) گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف ١) بخشی عظیم از کُردها؛ ٢) دهاتی؛ ٣) راهزن؛ ۴) از عشایر گوران؛ ۵) مرتع؛ ۶) تخلّص شاعری معاصر؛ ٧) نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**گۆڕان:** لە حاڵێکەوە بۆ حاڵێکی تر چوُن، بارەوباربوُن ف تغییر یافتن، متغیّرشدن.

**گوُران:** ١) ڕسکـــان، ڕەگداکـــوتـــانو ڕوان؛ ٢) ڕوحهاتنـــەبـــەرو دروستبوُنی پیزە: (ریشەکە **گوُراوە**و شین بوە، زارۆ لە زگیا **گوُراوە**)؛ ٣) لەپێست دەرهاتن ف ١) رستن؛ ٢) تکوین یافتن جنین در رحم؛ ٣) غلفتی از پوست خارج شدن.

**گوراندن:** ١) لەپێست دەرهێنان؛ ٢) سەربڕین ف ١) غلفتی از پوست خارج کردن؛ ٢) سر بریدن.

**گوڕاندن:** بەدەنگی قەو زیقاندن ف غریدن، نعرەزدن.

**گورانگە:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**گۆرانگە:** ١) پاوانی داری دارستان بۆ کەسێك؛ ٢) ناوی کوێستانێکە؛ ٣) جێگەی ڕێگران ف ١) درختان قرق شدۀ جنگل؛ ٢) نام ییلاقی است؛ ٣) مقرّ راهزنان.

**گورانن:** لەپێست دەرهێنان ف غلفتی پوست کندن.

**گۆڕاننەوە:** شتێ لەبەرانبەر شتێکا دان ف معاوضه کردن.

**گۆڕانەوە:** درانی شتێ لەبەرانبەر شتیکا ف معاوضه.

**گورانی:** چەندی، چەندایەتی ف کمیّت.

**گۆرانی:** ١) شێوەزمـانی تیرەی گۆران؛ ٢) قامو بەستـە ف ١) لهجـۀ «گوران»؛ ٢) ترانه.

**گۆرانیبێژ:** قامبێژ، دنگبێژ ف خواننده، ترانەخوان.

**گۆرانیچڕ:** گۆرانیبێژ ف ترانەخوان، خواننده.

**گۆرانیچڕین:** قامبێژی ف ترانەخوانی.

**گۆرانیخۆنن:** قامبێژی ف ترانەخوانی.

**گۆرانیزان:** گۆرانی بێژ ف ترانەخوان.

**گۆرانی کوتن:** قامبێژی ف ترانەخوانی.

**گۆرانی گوتن:** قامبێژی، گۆرانی کوتن ف ترانەخوانی.

**گۆرانیوتن:** قامبێژی، گۆرانی کوتن ف ترانەخوانی.

**گوُراو:** ١) ڕسکـاو؛ ٢) لەپێست دەرهـاتگ ف ١) تکوین یافته؛ ٢) از پوست درآمده.

**گۆڕاو:** لەبارێکەوە بۆ بارێکیتر چوُگ ف تغییر یافته.

**گوڕاو:** تانەی سەرچاو ف لکۀ چشم.

**گوربز:** چالاك، زرنگ ف چابك و بانشاط.

**گوربزە:** بەکەیفو تەیار ف سرحال و چاق.

**گورپك:** خەلّیف، پلوُرەهەنگ ف کندو.

**گوربە:** ١) پلوُرەهەنگ؛ ٢) نێرەپشیلە، کتکەنێر ف ١) کندو؛ ٢) گُربۀ نر.

**گوڕبەستن:** بەلەز ڕاکردن ف باشتاب دویدن.

**گوڕبەستنەوە:** بوُژانەوە ف سرحال آمدن بعد از زبوُنی.

**گۆڕبەگۆڕ:** جنێوە بۆ مردو ف گور بەگور.

**گورپ:** ١) کروشمەکردگ؛ ٢) بەفری پەستواوی بێ سەهۆڵ بەستن ف ١) کزکرده و مات؛ ٢) برف سفت شده بدون یخ بستن.

**گۆڕپشکنەك:** چالەکە، چوالو، کوڕەبەشە ف حیوان گورکن.

**گورپە:** ١) تەپەی دڵ، خورپە؛ ٢) پشیلەی نێر، گفر؛ ٣) گرتكئەستوُر ف ١) تپش قلب؛ ٢) گربۀ نر؛ ٣) درشت اندام.

**گورپەگورپ:** توندلێدانی دڵ، خورپەی توند ف تپش زیادقلب.

**گۆرت:** ١) لێـژ، بەرەوژێـرە، سەرەولـێـژایی؛ ٢) بنـــاری چیـا ف ١) سراشیبی؛ ٢) دامنۀ کوه.

**گورتل:** ئاپۆرە، حەشامات ف تودۀ مردم.

**گورج:** ١) زوُ، بلەز؛ ٢) چاپكو بەکار؛ ٣) کورت: (داوێنت **گورجە**)؛ ۴) ژنی زۆر جوان ف ١) بی درنگ؛ ٢) چابك و کاری؛ ٣) کوتاه؛ ۴) زن بسیار زیبا.

**گورجبوُنەوە:** ١) خۆئامادەکردن؛ ٢) دەبەرکردنەوەی جلی داکەندراو؛ ٣) کورتبونەوەی قوماش لەبەر شوتن ف ١) خود را آماده کردن؛ ٢) پوشیدن لباس بعد از کندن آن؛ ٣) آب رفتن پارچه.

**گورج کردنەوە:** ١) پۆشاككڕین بۆ بێجل؛ ٢) ئامادەکردنەوە ف ١) لباس نو به بیلباس دادن؛ ٢) آماده نمودن دوباره.

**گورجوگۆڵ:** بەکارو چالاك ف چست و چابك.

**گورجەوبوُن:** گورجبوُنەوە ف نگا: گورجبوُنەوە.

**گورجی:** ١) چالاکی؛ ٢) بێدرەنگی؛ ٣) ناوی ژنانە؛ ۴) ناوی هۆزێکە لە کوردستـان ف ١) چابکی؛ ٢) بی درنگی؛ ٣) نام زنـانـه؛ ۴) نام عشیرەای در کردستان.

**گورجێ:** دەس بەجێ، بێ درەنگکردن ف فوراً.

**گورچـك:** ١) گرچك، گرچو؛ ٢) مایچەی بەلەك؛ ٣) بن باخەڵ ف ١)

کلیه؛ ۲) ماهیچهٔ ساق؛ ۳) زیر بغل.
**گورچلنگ:** مایچەی بەلەك [ف] ماهیچهٔ ساق.
**گورچو:** گرچك، گرچو [ف] ۱) کُلیه؛ ۲) تهیگاه.
**گورچوبڕ:** گرچوبڕ [ف] نگا: گرچوبڕ.
**گوڕچەنگ:** گۆچان [ف] چوگان.
**گورچەویلە:** گرچو [ف] کلیه.
**گورچەوێلە:** گرچو [ف] کلیه.
**گورچیلك:** گرچو [ف] کلیه.
**گورچیلە:** گرچو [ف] کلیه.
**گورخ:** ۱) دڕوشەڕانی؛ ۲) قایموپتەو [ف] ۱) ماجراجو؛ ۲) محکم.
**گۆڕخانە:** ۱) قەبر؛ ۲) قەبرستان [ف] ۱) گور؛ ۲) گورستان.
**گورد:** ۱) دارێ کە دەخرێتە ناو ڕایەڵی تەون؛ ۲) چابك‌و بەکار؛ ۳) دەرفەت، کیس: (**گوردی خۆی لێ گرت**)؛ ۴) پاڵەوان؛ ۵) تاقەت، قەوەت: (**گوردی گرتەوە**) [ف] ۱) چوب وسط تار در بافندگی؛ ۲) چابك و زرنگ؛ ۳) فرصت؛ ۴) قهرمان، پهلوان؛ ۵) توان، نیرو.
**گۆرد:** ۱) شور، شمشێر؛ ۲) شیر و خەنجەری ژەنگاوی‌و کول [ف] ۱) شمشیر؛ ۲) شمشیر و خنجر کُند و زنگ زده.
**گوردالە:** گرچك، گرچو [ف] کلیه.
**گورد گرتن:** دەرفەت‌هێنان، کێس‌ئانین [ف] فرصت به دست آوردن.
**گوردە:** زاڕۆی ژن لە مێردی پێشو [ف] بچهٔ زن از شوهر پیشین.
**گوردەم:** حەشامات، ئاپۆرە [ف] شلوغی و انبوه مردم.
**گوردم گوردی:** کۆمەڵ‌کۆمەڵ [ف] گروه گروه.
**گوردی:** نێوان هەردوك شان [ف] میان دو کتف، گرده.
**گوڕران:** گوڕاندن [ف] غریدن.
**گورز:** ۱) پەت‌و پەڕۆی بادراوی ڕەق بۆ کایەکردن؛ ۲) باقەبێنی لێك‌بادراو؛ ۳) ئامرازێکی سەرئەستوری دەسکدارە بۆ شەڕ [ف] ۱) گرز پارچه‌ای یا ریسمانی برای بازی؛ ۲) بسته‌بند پیچیدهٔ گیاهی؛ ۳) گرز پهلوانان.
**گۆرز:** گیایەکی دەشتەکیە، ڕەوکێکە بیاوانی [ف] از گیاهان صحرایی.
**گورزان:** بازی بە گورز [ف] بازی با گرز پارچه‌ای.
**گورزانێ:** گورزان [ف] نگا: گورزان.
**گۆڕزرینگاندنەوە:** جوێنە بە مردگ: (**گۆڕی زرینگاندەوە**) [ف] دشنام به مرده.
**گورزك:** گورزی چکۆڵە [ف] گرز کوچك.
**گورزە:** ۱) باقەی گەورە لە باقەبین؛ ۲) ناوە بۆ سەگ؛ ۳) جرجەمشکی دەشت؛ ۴) دەستەوارەیەك لە گیا؛ ۵) گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد [ف] ۱) بستهٔ بزرگ از بسته‌بندگیاهی؛ ۲) نامی برای سگ؛ ۳) موش بزرگ صحرایی؛ ۴) پریك آغوش گیاه؛ ۵) نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.
**گورزەکوێرە:** جۆرێ گورزانێ [ف] نوعی بازی.
**گورزەهۆن:** هۆندنەوەی گوریس بە سێ‌لۆیە [ف] نوعی طناب‌بافی.
**گورزەهەن:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد [ف] نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.
**گورزی‌بن‌مێخ:** جۆرێ گورزانێ [ف] نوعی بازی.
**گورزی‌ژێربەڕە:** جۆرێ گورزانێ [ف] نوعی بازی.
**گورزێن:** گورزان، گورزانێ [ف] بازی با گرز.
**گوڕژ:** گرمەی هەور [ف] غرّش ابر، رَعد.
**گۆڕژال:** بەن‌ساموڕتە [ف] فتراك.
**گوڕژان:** کەوڵ‌کران، پێست‌لێ‌دارنین [ف] پوست کندن.
**گوڕژان:** گرمەهاتن [ف] صدای مهیب آمدن.
**گوڕژاندن:** هەورگرماندن [ف] غرّیدن ابر.
**گۆڕسان:** قەبرستان [ف] قبرستان.
**گۆڕستان:** گۆڕسان [ف] قبرستان.
**گورشتە:** ڕوداوی پێشو: (سەرگورشتەی خۆی گێڕاوە) [ف] رویداد گذشته.
**گۆڕغەریب:** مردو لە ئاوارەیی‌دا [ف] در غربت مرده.
**گۆڕك:** ۱) تەختایی مەجلیس؛ ۲) ئاگردانی کۆڕ [ف] ۱) صحن مجلس؛ ۲) آتشدان مجلس.
**گۆڕکوڵ:** قەبرکەن [ف] آدم گورکن.
**گۆڕکە:** گۆڕك [ف] نگا: گۆڕك.
**گۆڕکەنکە:** قەمتار، کەمتیار [ف] کفتار.
**گورگ:** گور، شینۆ [ف] گرگ.
**گورگـان‌خواردو:** ۱) برێتی لە تۆشی‌بەلابوونی بێ‌فریاڕەس؛ ۲) ریخۆڵەیەکە [ف] ۱) کنایه از بی یاورگرفتار شدن؛ ۲) بخشی از روده.
**گورگـانەشەوێ:** گۆرانیەکە بۆ دەخەوکردنی زاڕۆی دەڵێن [ف] آهنگی برای لالایی بچه.
**گورگاو:** دەنکێکی تاڵە لە گەنم‌دا [ف] تلخك گندمزار.
**گورگاور:** ئاوڕدانەوەیەکی بەپەلەو لە غاردان‌دا [ف] جواب عجولانه.
**گورگ کوژە:** گیایەکی ژەهراویە دڕندە دەکوژێ [ف] گیاهی است سمّی.
**گورگرتنەوە:** گوڕبەستنەوە، بوژانەوە [ف] بازیافتن نشاط.
**گورگـورانێ:** ئاریکاری‌کردنی خزمان بۆ یەکتر [ف] همکاری خویشاوندان با هم.
**گورگ‌نەخۆرە:** ۱) برێتی لە کیژو ژنی ناحەز؛ ۲) سپڵ [ف] ۱) کنایه از زن بدگل؛ ۲) طحال.
**گورگوتاو:** ڕفان‌ڕفان، فڕان‌فڕان [ف] هرکی‌هرکی، بچاپ بچاپ.
**گوڕگـوڕ:** ۱) خوڕخوڕ: (فرمێسکی **گوڕگوڕ** دەوەراند)؛ ۲) زوڕزوڕ، گریانی بەدەنگی بەرز؛ ۳) هەراو زیقەزیق [ف] ۱) شُرشُر؛ ۲) شیون و زاری؛ ۳) جیغ و داد.
**گوڕگـوڕی:** ۱) کەسێ کە زۆر زیقەو هەرا دەکا؛ ۲) هەوری زۆر بەگرمەگرم [ف] ۱) جیغ جیغو؛ ۲) ابر پرغرش.
**گۆڕگـوم‌بوون:** وشەیەکە بۆ مردوی وای دەڵێن کە حەزیان لە مردنی کردبێ [ف] یاد مرده‌ای که دوستش نداشتند.
**گورگومێش:** بولێڵە، شەوەکی [ف] سپیده‌دم، گرگ و میش.

**گورگـه:** ۱)کەڵەی توتن‌و بیستان؛ ۲) گورگاو؛ ۳) سەربانی پاسارەی بان؛ ۴) سڵ، قوت؛ ۵) سڵی، رەوەکی: (گـــورگــه دەکـا لێم نزیك نابێتەوە)؛ ۶) دەسبڕ و فێڵباز؛ ۷) لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف ۱) گیاه انگل پالیزو توتون؛ ۲) تلخك گندمزار؛ ۳) روی لبۀ بام؛ ۴) رموك؛ ۵) رموکی؛ ۶) شیّاد؛ ۷) روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**گورگەبوون:** سڵ‌بوون، رەوینەوە ف رم کردن.

**گورگەپشت:** زەق، زۆپ، هەڵتۆقیو ف برآمده.

**گورگەچال:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**گورگـەچـاوسـوور:** گونـدێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**گورگەچیا:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**گورگـەخـەو:** کەروێشکـەخەو، سوکەڵەخەو: (لازمە بۆ شێخ سبەینان گورگـەخـەو/ تا بڵێن شێخ عابیدەو نانـوێ بەشەو) «شێخ‌ڕەزا» ف خواب سبك.

**گورگەدەر:** گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدۀ کردستان توسط بعثیان.

**گورگەزێ:** باران‌و خۆرەتاو پێکەوە ف باران و آفتاب با هم.

**گورگەشامار:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**گورگەشەوێ:** گورگانەشەوێ ف آهنگی برای لالایی بچه.

**گورگـەکـاکـەولا:** گونـدێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**گورگەلوور:** دمەلاسکەی گورگ لە لووراندا ف ادای زوزۀ گرگ درآوردن.

**گورگەلورە:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**گورگەلۆق:** قۆترە، قەترە، قۆتە ف هرولە.

**گورگەلۆقە:** گورگەلۆق، قۆرتە ف هرولە.

**گورگەمزە:** گیایەکە ف گیاهی است.

**گورگەسێش:** ۱) بێچوی دورەگ لە سەگ‌و گورگ؛ ۲) سەگی زیانی خرۆکە پەزدەخوا؛ ۳) بریتی لە زمان‌لووسی بێ‌ئاکار ف ۱) بچۀ دورگۀ سگ و گرگ؛ ۲) سگی که گوسفند می‌دَرَد؛ ۳) کنایه از منافق و چاپلوس.

**گورگەیی:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**گورگی:** رەنگی‌شینکی ف رنگ خاکستری.

**گورگی‌باران‌دیدە:** بریتی لە پیاوی بەتەجرەبەو ئەزموون ف کنایه از باتجربه.

**گورگی‌داودیدە:** گورگی باران دیدە ف کنایه از باتجربه، گرگ باران دیده.

**گورگیلە:** کەندوی پچووك بۆ دەخڵ‌و ئارد ف کندوی کوچك غلّه و آرد.

**گورگین:** ۱) ناوە بۆ پیاوان؛ ۲) بزنەمەرەزی سووری مەیلەوبۆر ف ۱) نام مردانه؛ ۲) بز قهوه‌ای کم‌رنگ.

**گورگی‌هار:** بریتی لە پیاوی بەئازارو بەدکار ف کنایه از مردم آزار.

**گورم:** گرمە ف غرنب.

**گۆرم:** ۱) ژن خوشـــك، خۆشکی ژن؛ ۲) خۆشکی مێرد، دوش ف ۱) خواهر زن؛ ۲) خواهرشوهر.

**گۆرمار:** کۆرەمار ف مارسام.

**گورماندن:** گرماندن ف غرنبیدن.

**گورمتە:** پەلامار، شالاو، حەملە ف یورش، حمله.

**گۆرمچە:** مست، مشت ف مشت.

**گورمز:** بزە، زەردەخەنە ف لبخند.

**گۆرمز:** گۆرمزە، خەردەلەکێویلە ف گیاهی است.

**گۆرمـزە:** گیایەکـە وەك ئەسپـەنـاخ کە دەخورێ، خەردەلی کێوی ف گیاهی است خوردنی شبیه اسفناج، خردل کوهی.

**گورمزین:** بزە هاتنەسەرلێوان ف لبخند، برلب آمدن.

**گورمژ:** ۱) شالاو، هێرش، پەلامار؛ ۲) نەعرەتە ف ۱) یورش، هجوم؛ ۲) عَربده، غُرّش.

**گورمژین:** ۱) شالاوبردن، هێرش کردن، پەلاماردان؛ ۲) نەعرەتەی شێر ف ۱) یورش بردن؛ ۲) غُرّیدن شیر.

**گورمست:** چنگورك ف نگا: چنگورك.

**گۆرمشت:** مستەکۆڵە، مشتی قووچاو ف مشت گره شده.

**گورمـك:** ۱) پێشـەی شان؛ ۲) گرۆڤەر؛ ۳) زۆپ، زەق؛ ۴) کڵۆ ف ۱) استخوان شانه؛ ۲) مُدوّر؛ ۳) برجسته؛ ۴) کلوخ.

**گۆرمۆچ:** مست ف مشت.

**گۆرمۆڕە:** تێکەوەدانی ئاپۆرە ف شلوغی و ازدحام.

**گورمە:** گرمە ف غرنبه.

**گورمەچك:** جومگەی دەست ف مُچ دست.

**گورمەگورم:** گرمەی زۆرو لەسەریەك ف غرنبۀ پیاپی.

**گورمی:** ۱) جۆراو؛ ۲) گوڕاندی، گوڕراندی ف ۱) جوراب؛ ۲) غُرید.

**گۆرمیچ:** مستەکۆڵە، پەنجەی لێك‌نراو ف مشت گره شده.

**گورمین:** ۱) گرماندن؛ ۲) گۆرەوی، جۆراو ف ۱) غُریدن؛ ۲) جوراب.

**گورن:** هیلکەگون ف بیضه.

**گۆڕن:** قەبر، گۆڕ ف گور، قبر.

**گوڕنووك:** دەوەنێکی دڕکاویە ف درختچه‌ای است خاردار.

**گۆڕنەباش:** ۱) کەمتیار؛ ۲) چالەکە ف ۱) کفتار؛ ۲) حیوان گورکن.

**گوڕنەتەڵە:** ناوێکی بێ‌ناوەرۆکە ف موجودی خیالی.

**گـوڕنی:** ۱)دەوەنێکە؛ ۲) گیـای تازەڕواو، شینکـە؛ ۳) جێگـەی گوڵ پـەروەردەکردن؛ ۴) قـوتەکـەی پوتـەکەی خـریلە ف ۱) درختچـه‌ای است؛ ۲) گیاه تـازه سردرآورده؛ ۳) گُلخـانه؛ ۴) کوچولوی مدوّر بی‌نمود.

**گورنیك:** بەن‌سامۆرتە ف فتراك.

**گورۆ:** ١) تۆگر، خۆ‌پێ‌گرتو؛ ٢) گرێو؛ ٣) بەگلو داوەستان، دانار ف ١) اُنس گرفته؛ ٢) نگا: گرێو؛ ٣) دانەدانەشدن روغن و...

**گوڕو:** ١) گڕوێ؛ ٢) گڕوی زارۆك ف ١) آبلەگون؛ ٢) بهانهٔ بچه.

**گوڕوا:** گورمی، جۆراب، جۆراو ف جوراب.

**گوڕواباف:** ١) کەسێ کە گوڕوا دەچنێ؛ ٢) باڵدارێکی زۆر پچوکە ف ١) جوراب‌باف؛ ٢) پرنده‌ای بسیار کوچك.

**گوڕواچن:** گوڕواباف ف نگا: گوڕواباف.

**گورواسە:** پشیلەکێوی ف گربهٔ وحشی.

**گوروتا:** گرەوتا ف نگا: گرەوتا.

**گوروتش:** کرەوتش ف نگا: کرەوتش.

**گوروتە:** گرەوتا ف نگا: گرەوتا.

**گوڕۆز:** زاروی گڕوگرو گرینۆك ف بچهٔ بهانه‌گیر و گریان.

**گوڕۆز:** تۆمار، نوسراوی لوڵدراو ف طومار.

**گوڕۆزی:** پەڵپو گڕوگرتن ف گریه و بهانه‌گیری.

**گوروشتە:** گورشتە ف نگا: گورشته.

**گوروگورۆ:** داناردانار ف دان دان.

**گوروڵ:** گرۆڵ ف خشتك.

**گوروڵە:** گرۆڵ ف خشتك.

**گورۆن:** گرۆن ف غلفتی.

**گورۆنـی:** ١) گرۆنی، جۆرێ پارچـــە؛ ٢) ناوە بۆ پیاوان ف ١) نوعی پارچه؛ ٢) نام مردانه.

**گوروە:** کار، خەبات، ئیش ف کار.

**گورویس:** پەتی درێژ ف رسن، طناب.

**گورە:** گوروە، کار ف کار.

**گوڕە:** ١) دەنگی زۆر زل‌و بەقەو؛ ٢) ترساندن بە قسە؛ ٣) دەنگی عەور ف ١) غرش؛ ٢) نهیب، تهدید لفظی؛ ٣) صدای رعد.

**گۆڕە:** ١) بەرانبەر، بەپێی: (لە گۆڕەی قسەی تۆ)؛ ٢) گوڕوا، جۆراب؛ ٣) گۆر، بێچوی چێڵ؛ ٤) لەکارزان؛ ٥) ئەندازە، ڕادە ف ١) برطبق، برابر با؛ ٢) جوراب؛ ٣) گوساله؛ ٤) کاردان، کارشناس؛ ٥) اندازه.

**گۆرە:** ١) گوڕوا، جۆڕاو؛ ٢) گۆر، گۆرە، بێچوی چێڵ ف ١) جوراب؛ ٢) گوساله.

**گۆڕەبا:** ١) لەوێنە، وەك، لەچەشن؛ ٢) ئەندازە ف ١) مثل، مانند؛ ٢) اندازه.

**گۆڕەبۆتا:** گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**گۆڕەپان:** تەختایی زەوی ف زمین هموار.

**گورەتەنە:** وەرگرتن، ساندن، ئەستاندن ف دریافت داشتن.

**گۆڕەد:** کەوەرگ، کەوەر. *لە سەوزیجاتە* ف تره، گندنا.

**گۆڕەدێیە:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**گۆرەسا:** پەتێ کە گۆروپانێری پێ دەبەستنەوە ف رسن گردن گوساله.

**گۆڕەشە:** ترساندن بە قسە ف تهدید.

**گۆڕەشەلە:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**گۆڕەشیر:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی درکردستان که بعثیان آنرا ویران کردند.

**گۆڕەڤان:** زێدەوان، زێوەوان ف نگهبان گورستان.

**گۆرەکڵە:** گۆری چکۆڵە، بێچوەچێڵی تازەزاو ف گوسالهٔ کوچولو.

**گۆرەکە:** گۆر، گۆرە، بەچکەچێڵ ف گوساله.

**گۆڕەگنۆرە:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**گۆڕەگوڕ:** ١) زەنا زەنا؛ ٢) گرمەگرمی هەور ف ١) سر وصدای زیاد؛ ٢) غرش ابر.

**گۆڕەنیش:** سەربەرەوخوارە، لێژی، سەرەژێرە ف سراشیبی.

**گۆڕەوا:** گوڕوا، جۆڕاو ف جوراب.

**گۆڕەوان:** گۆڕەڤان ف نگهبان گورستان.

**گۆڕەوشار:** شکنجەو ئازاری ناو قەبر بۆ مردگ ف شکنجهٔ مرده در گور.

**گۆڕەوکەنە:** چـالەکە، چوالـو، کورەبەشە، گۆڕپشکنـەك ف حیـوان گورکن.

**گۆڕەوی:** گۆڕەوا ف جوراب.

**گۆڕەویچنە:** باڵندەی گوڕواچن ف پرنده‌ایست بسیار کوچك.

**گۆڕەویلە:** گۆڕەویچنە ف نگا: گۆڕەویچنه.

**گۆڕهەلاخنین:** گۆڕزرینگاندنەوە ف دشنام به مرده.

**گۆڕهـەڵبـەستن:** سەری قەبـر بە خشت‌و قسڵ دابەستن ف سنگ و خشت بر گورگذاشتن.

**گۆڕهـەڵتـەکێنـە:** وشەیەکە لە دوی مردوێکی دەڵێن کە میراتی زۆرەو کوڕی نیە ف اصطلاحی است دربارهٔ مردهٔ ثروتمند فاقد وارث پسر گویند.

**گۆڕهەڵکەن:** پیاوێ کە پیشەی قەبرکۆڵینە ف آدم گورکن.

**گۆڕهەڵکەنە:** چوالو، کورەبەشە ف حیوان گورکن.

**گورەیش:** ١) کارکردن؛ ٢) خزمەتکاری، نۆکەری ف ١) کارکردن؛ ٢) نوکری.

**گوری:** وشەیەکە بۆ لێك‌جیاکردنەوەی پەز ف کلمه‌ای برای جداکردن گوسفندان از همدیگر.

**گوڕی:** ١) گوڕانـــدی؛ ٢) گڕوێ؛ ٣) بڵێسـە، گڕی ئاگر؛ ٤) خوڕی، تەوژمی ڕوبـــار؛ ٥) زۆر کەچـــەڵ؛ ٦) جێگـــەی دەخڵێ کە سەرمـا هەڵی‌تەکـانـدوە ف ١) غُرید؛ ٢) نگـا: گڕوێ؛ ٣) زبـانهٔ آتش؛ ٤) جریان شدید رودخانه؛ ٥) بسیار کچل؛ ٦) کشتزاری که سرما آن را خراب کرده باشد.

**گۆری:** ١) قوربان، سەدەقە؛ ٢) گۆڕەوی ف ١) قربان، فدا؛ ٢) جوراب.

**گۆڕی:** لە بارێکەوە بردیە بارێکی تر ف تغییر داد.

**گۆڕیا:** گۆڕا ف تغییر یافت.

**گەعتیل:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**گەف:** ١) ترسـانـدن بە قسە، گف، گڤ؛ ٢) مجوڕکی لەش، تەزو؛ ٣) خۆهەڵکێشان، پەسنی خۆدان؛ ٤) حەپەی سەگ؛ ٥) کاری خوێر یانە: ٦) فیڵ و گزی؛ ٧) گاڵتـە، گەپ؛ ٨) قسەی بێ تام ف ١) تهدید؛ ٢) تیر کشیدن اندام؛ ٣) لاف؛ ٤) پارس، واق؛ ٥) هرزگی؛ ٦) حیله؛ ٧) شوخی؛ ٨) یاوه.

**گەفاندن:** هەڕەشەکردن ف تهدید.

**گەف‌خواردن:** ترساندن به قسه ف تهدیدکردن.

**گەف کردن:** ١) ترساندن به قسه؛ ٢) گاڵتەکردن ف ١) تهدیدکردن؛ ٢) شوخی کردن.

**گەفۆك:** چەنەبازی بێتام‌بێژ ف یاوه‌گو.

**گەف‌وگوڕ:** گەف‌کردن ف تهدید.

**گەفـە:** ١) گەپـە، حەپـەی پیرەسەگ؛ ٢) گاڵتە، جەفەنگ ف ١) واق پیرسگ؛ ٢) شوخی.

**گەفین:** ١) حەپین، ڕەوین؛ ٢) گوڕەشەکردن ف ١) پارس کردن سگ؛ ٢) تهدید.

**گەڤ:** گەف، گف، گڤ ف تهدید.

**گەڤا:** شایەت، ئاگادار لە ڕوداو ف شاهد، گواه.

**گەڤار:** پیس، گەمار ف چرکین، کثیف.

**گەڤالە:** پەڵەهەوری ڕەشی بەباران ف لکه ابر سیاه.

**گەڤر:** ١) سپی ئامالٚ‌زەرد؛ ٢) کەوە، بۆر ف ١) سپید مایل به زردی؛ ٢) توسی رنگ.

**گەڤـرك:** ١) یۆڕی مێوینە، جوتی ئاڤدەل؛ ٢) چێرگ، میشەسی ف ١) دراج مادینه؛ ٢) هوبره.

**گەڤری:** بستو، زینو، ملەی چیا ف یال کوه.

**گەڤریلە:** سوێسکە، سوسك ف تیهو.

**گەڤـز:** ١) ئەوەنـدەی لە دروێنـەدا دێتـە ناو داسەوە؛ ٢) لەسەر تەنشت تل‌خواردن ف ١) مقداری از درو که یکبار در داس آید؛ ٢) بر پهلو غلتیدن.

**گەڤزان:** گەڤزدان، تل خواردن لەسەر تەنشت ف غلتیدن به پهلو.

**گەڤزاندن:** تل پێدان لەسەر تەنشت ف غلتانیدن بر پهلو.

**گەڤزدان:** گەڤزان ف غلتیدن بر پهلو.

**گەڤزك:** جێگەی گەڤزان ف جای غلتیدن بر پهلو.

**گەڤزۆ:** ئەوی کە دگەڤزە ف بر پهلو غلتان.

**گەڤزۆك:** بنیادەم یان حەیوانێ کە زۆر گەڤز دکە، گەڤزۆ ف بر پهلو غلتان.

**گەڤزین:** گەڤزان ف غلتیدن بر پهلو.

**گەڤل:** ١) شەوەکی، بەرەبەیانی زوو، بوڵێلە؛ ٢) شەپۆلی زل ف ١) گرگ و میش، سپیدهٔ اولی؛ ٢) موج بزرگ.

**گەڤلین:** ١) بەرەبەیان‌بوون، بوڵێلە پەیدابوون؛ ٢) شەپۆلی زل‌دان ف ١) سپیده‌دمیدن؛ ٢) موج بزرگ دادن.

**گەڤۆزە:** مۆ ماش‌و برنجی ف و جوگندمی.

**گەڤۆك:** هەڕەشەکەر ف تهدیدکننده.

**گەڤۆگوڕ:** گەفوهەڕشە، هەڕەشەوگوڕەشە ف تهدید و ارعاب.

**گەڤە:** گێلۆکە، زار، بەسەزمان ف هالو، فقیر حال.

**گەڤەر:** ١) پەراوێز؛ ٢) سوچ، قوژبن ف ١) حاشیه؛ ٢) گوشه.

**گەڤەز:** ١) گیایەکە بەنی پێ سوور دەکەن؛ ٢) ڕەنگی سووری کەش ف ١) گیاهی است که رنگ قرمز از آن گیرند؛ ٢) رنگ قرمز آتشین.

**گەڤەزە:** خۆپەسند، خۆبەزل‌زان ف خودپسند، خودبین.

**گەڤەگژ:** سەرقژن‌و تێکەڵاو ف ژولیده‌موی.

**گەڤەل:** گەڤالە ف لکه‌ابر سیاه.

**گەڤەندە:** شەلاتی، سەرسەری، بێ‌شەرم ف بی آزرم و حیا.

**گەگانە:** جاروبارە، گابەگایی ف گاهگاه.

**گەگر:** یەکسمێ کە لە ڕۆیشتن سەرپێچی دەکاو مان دەگرێ ف ستوری که از رفتن امتناع می کند.

**گەگرتن:** پێ‌چەقاندن‌و نەڕۆیشتن ف از رفتن امتناع ورزیدن.

**گەگە:** بەندبەند ف بندبند.

**گەل:** ١) کۆمەڵ؛ ٢) زۆر، زێدە؛ ٣) کۆمەڵەبنیادەمی هاو نەژادو خاوەنی زمان‌و خدەو خوی تایبەتی بەخۆیان؛ ٤) پاشگری کۆ ف ١) گروه؛ ٢) بسیار؛ ٣) ملّت؛ ٤) پسوند جمع.

**گەڵ:** ١) پێڕا؛ ٢) پەلکی دار کە بۆ خۆراکی حەیوانات هەڵدەگیرێ؛ ٣) دارسـتـانێ کە هەر دەوەنـەو داری بەرزی نیە؛ ٤) نێوان دوڕان ف ١) همـراه؛ ٢) برگ علوفـهٔ حیوانات؛ ٣) جنگل درختچه بدون درخت بزرگ؛ ٤) میان هردوران.

**گەلا:** نێرەقە، باسکەئامور ف خیش.

**گەڵا:** پەلك، پەلکی دارو گیا ف برگ درخت و گیاه.

**گەلاج:** ١) شەلاتی؛ ٢) دەسبڕ ف ١) لات؛ ٢) کلاهبردار.

**گەڵاج:** گەلاج ف نگا: گەلاج.

**گەلاحە:** گەردن‌بەندی گا، قەڵەدەی ئەستۆی گاو چێڵ ف قلادهٔ گاو.

**گەڵاخان:** سەردەمی گەڵاڕێزان ف موسم برگریزان.

**گەڵاخەزان:** بەرگڕێزانی پایز ف برگ ریزان.

**گەڵادار:** ١) پەلکی دار؛ ٢) داری بەپەلك ف ١) برگ درخت؛ ٢) درخت پُربرگ.

**گەڵادە:** گڵادە ف نگا: گڵادە.

**گەڵادەرکردن:** پەلك‌لێ‌ڕوانی ڕوەك ف جوانه‌زدن برگ.

**گەڵاڕن:** پەلك لە ڕوەك داکەندن، پەلك لێ کردنەوە ف از برگ لُخت کردن.

**گەڵاڕێزان:** ١) جەنگەی پەلکی داروەرین؛ ٢) مانگی خەزەڵوەر ف ١) موسم برگریزان؛ ٢) مهرماه.

**گەڵاڕێژان:** گەڵاڕێزان ف نگا: گەڵاڕێزان.

**گەلاز:** ١) گلاز؛ ٢) گەڵاس ف ١) نگا: گلاز؛ ٢) نگا: گەڵاس.

**گەلازەل:** گەڵاو پوش‌و چیلکەی ئاڵاش ف انبیره.

**گەڵاس:** ١) ئالوچەسوورە؛ ٢) ئالوچەزەردە؛ ٣) میوەیەکە وەك بەلاڵوك

دەچێ بەڵام توزێ درشت‌ترەو شیرینە ف ۱) آلوسرخ؛ ۲) آلوزرد؛ ۳) گیلاس.

**گەلاش:** نان‌دێن ف جای نان.

**گەلاشان:** ۱) وردەی پەڕیوی لوکەو مو لە هەلاجی‌و شەکردندا؛ ۲) خشت و خاڵی ناوجوگە کەبەری ئاو دەگرێ ف ۱) تکّه‌های پنبه و امثال آن در هلاّجی و...؛ ۲) خس و خاشاك داخل جوی که جلو آب را می‌گیرند.

**گەڵاکردن:** ۱) پەلـك‌لێ‌ڕوان؛ ۲) پەلکەمێو لە دار چنین ف ۱) برگ دادن؛ ۲) برگ مو چیدن.

**گەڵاکوت:** تێڵای گەڵاوردکردن ف کدینه، برگ کوب.

**گەڵاکوتك:** گەڵاکوتك ف برگ کوب.

**گەلاکەردو:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**گەڵاکەوتن:** جەنگەی پەلك‌وەرینی داران ف موسم برگ‌ریزان.

**گەلال:** وردەبەردی لوسی ناوچەم ف ماسهٔ رودخانه.

**گەلالوچ:** زمانەچکوڵە، ئەلنگە ف زبان کوچکه.

**گەلالوچك:** ئاڵوی گەرو ف لوزتین.

**گەلالوچك:** ئاڵوی گەرو ف لوزتین.

**گەلالە:** ۱) ئاڵو، خڕایی گەرو، گەلالوچك؛ ۲) نمونە؛ ۳) پێش‌نوس؛ ۴) شارێك‌و گوندێکی کوردستانن بەعسی وێرانی کردن ف ۱) لوزتین؛ ۲) طرح؛ ۳) پیش‌نویس؛ ۴) نام شهر و روستایی در کردستان که بعثیها ویران کردند.

**گەڵاڵە:** ۱) گڵاڵە؛ ۲) ناوی شاروکێکە؛ ۳) ناوی ناوچەیەکە لە کوردستان ف ۱) نگا: گلاّله؛ ۲) نام شهرکی است؛ ۳) نام ناحیه‌ای در کردستان.

**گەڵاڵی:** ناوی عەشیرەتێکی کوردە: (سەرکەشی عێلی **گەڵاڵی** شوخی بابانی عێراق) «کوردی» ف نام عشیره‌ای است.

**گەلالیشك:** سوچ‌و گوشەی زار ف گوشهٔ لبان.

**گەلالیەکان:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**گەڵامێو:** پەلکی ڕەز ف برگ مو.

**گەلانکە:** جار، دەحفە، چەل، کەڕەت ف دفعه.

**گەلاو:** قومارێکە بە مورەی نەرد دەکرێ ف نوعی بازی است که با مهرهٔ نرد کنند.

**گەڵاو:** گڵاو، پیس ف پلید.

**گەڵاوگەڵ:** ڕیگەچون بە پای لێکەوەدور ف راه یافتن با پاهای از هم باز.

**گەڵاوی:** گڵاوی ف پلیدی.

**گەلاوێژ:** ۱) ئەستێرەیەکی زور گەشە لە نیوەی هاوینڕا دەبیندرێ؛ ۲) مانگی پێنجەمی ساڵ، نێوەڕاست‌مانگی هاوین؛ ۳) ناوە بو ژنان؛ ۴) گیشە گەنمی درواو ف ۱) ستارهٔ شعرا؛ ۲) ماه مرداد؛ ۳) نام زنانه؛ ۴) تودهٔ درویدهٔ غلّه.

**گەلاوێژئەنگوتن:** سەرەتای دیاری‌دانی ئەستێرەی گەلاوێژ ف طلوع ستارهٔ شعرا.

**گەلاوێژی:** ۱) ڕێزکردنی باقەدەخڵ کە گوڵەکان بچنە سەریەك؛ ۲) بڕکەخەیارێ کە دوای گەلاوێژئەنگوتن بەر بدا ف ۱) رده کردن بسته‌های غلّهٔ درویده به ترتیبی که خوشه‌ها برهم آیند؛ ۲) بوته‌خیاری که بعد از طلوع ستارهٔ شعرا ثمر دهد.

**گەلبازە:** کومەڵی باڵداران پێکەوە لەحەواوە ف دستهٔ برندگان در حال پرواز.

**گەلبون:** کوبونەوەی حەشامات ف اجتماع مردم.

**گەل بەستن:** کوبونەوە لە دەوری یەکتر ف همایش.

**گەلپ:** بەباڵایی لاشەویلاکە، گوپ ف لُپ.

**گەلپەرستی:** زێدخوشویستن، گەل‌حەز ف ملت‌خواهی، مردم‌دوستی.

**گەڵتە:** گاڵتە ف شوخی.

**گەلج:** کێشەو دم‌بەدمە ف جدال.

**گەلحو:** زەلامی دەبەنگ‌و ناتێگەیشتو ف تنومند احمق.

**گەلحەز:** میللەت‌خوشەویست ف ملّت دوست.

**گەلخور:** بریتی لە خاوەن‌دەسەڵاتی بێ‌بەزەیی دەگەڵ ژێردەستاندا ف کنایه از حاکم ستمگر.

**گەڵخور:** ئاژەڵێ کە بە پەلکەدار دەژی ف دامی که از برگ می‌چرد.

**گەلدار:** داری زل ف درخت تناور.

**گەلش:** کێشەو دمەقاڵە ف نزاع و کشاکش.

**گەلگەی:** گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**گەللات:** مفتەخور، چەورەی‌ماڵانگەڕ ف مُفت‌خور.

**گەللاس:** ئاژاوە، پشێوی ف آشوب و فتنه.

**گەللاو:** گەلاو، قومارێکە ف نگا: گەلاو.

**گەللایی:** گوێ‌نەدەر بە هیچ شت ف بی‌مبالات.

**گەللەك:** یەکجارزور ف بسیار زیاد.

**گەلنازکێ:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**گەلو:** ۱) تو بێژی: (**گەلو** دەبێ وابێ)؛ ۲) کاورا، ئەی کەسێ کە قسەی دەگەڵ دەکەم؛ ۳) ئەی خەڵکینە ف ۱) تو گویی؛ ۲) ای فلان؛ ۳) ای مردم.

**گەلو:** گەروُ ف نگا: گەروُ.

**گەڵوُ:** گەروُ ف نگا: گەروُ.

**گەڵواخی:** ناوی ناوچەوعەشیرەتێکە ف نام منطقه و عشیره‌ای در کردستان.

**گەلواز:** سەرماو بەستەڵەکی لەنکاو ف سرمای ناگهانی.

**گەڵواز:** ۱) گڵواز؛ ۲) گورانی تایبەتی بو خوشی چرودەرکردنی دار لە بەهاردا؛ ۳) زنجیرەبون بەشوێن یەکا ف ۱) نگا: گلواز؛ ۲) ترانه مخصوص جشن جوانه‌زدن درختان؛ ۳) به دنبال هم ردیف شدن.

**گەڵوازە:** ۱) گورانی چرودەرکردنی دار: (هەوران گازەگازە دەخوێنن

**گەڵوازە**)؛ ٢) رستەموروێی سوور و شین کەبە بێشکەوە هەڵداوەسرێ؛ ٣) گوێز و هەنجیری بەبەنەوە کراو؛ ٤) فڕینی باڵداران بەکۆمەڵ پێکەوە لە حەوا ف ١) ترانۀ مخصوص جشن جوانەزدن درختان؛ ٢) رشتە مهره‌های رنگین کە بە گهوارە آویزند؛ ٣) انجیر و گردوی بانخ رشتە شده؛ ٤) دستۀ پرندگان در حال پرواز.

**گەڵواگەڵوا:** گەلاوگەڵ ف نگا: گەلاوگەڵ.

**گەڵواڵك:** گیایەکە بنەکەی دەخورێ ف گیاهی است با پیازۀ خوردنی.

**گەڵۆر:** زلحۆرت ف لندهور.

**گەڵۆرە:** گەڵۆر ف لندهور.

**گەڵۆری:** مۆرانە خواردوی ریزاڵ ریزاڵ ف موریانە خوردۀ پوسیده.

**گەڵــۆز:** ناوگەڵ، بەتـالاّیی نێوان دوو ڕان. *تایبـەتی بۆ سەگ دەیڵێن* : (کلکی دە **گەڵۆزی** گرت) ف میان رانها. *برای سگ گویند*.

**گەڵـوس:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان کە توسط بعثیان ویران شد.

**گەڵۆس:** گەڵۆز ف نگا: گەڵۆز.

**گەڵۆگر:** گەروێر ف گلوگیر.

**گەڵـوەزە:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان کە توسط بعثیان ویران شد.

**گەڵوێژ:** لیکاوی دەم ف لعاب دهن.

**گەلـە:** ١) کەرتکـە، کۆمەڵێ پێکەوە؛ ٢) زۆر، زاف؛ ٣) گەڵای ڕزیوی وەریو ف ١) قطیع، گروه؛ ٢) زیاد، بسیار؛ ٣) برگ خزان.

**گەڵە:** عوور، کرش ف شکمبه.

**گەلەجوت:** زبارەی ئاوایی بۆ پێکەوە کێڵانی زەوی ف تعاونی شخم‌زنی.

**گەلەخان:** ئاغەڵ ف آغل.

**گەلەخەن:** جوابی بێ‌مەبەستو بەخۆڕایی ف جواب بی‌هدف و سرسری.

**گەلەدرەو:** زبارەی دروێنە ف دروکردن تعاونی.

**گەلەڕاویژە:** تەگبیرکردنی بەکۆمەڵ ف کنکاش دستەجمعی.

**گەلەڕاویژی:** گەلەڕاویژە ف کنکاش دستەجمعی.

**گەلەك:** زەحف، زۆر ف بسیار.

**گەلە کۆمە:** هاوکاری کردنی بەکۆمەڵ ف تعاون گروهی.

**گەلە کۆمەك:** گەلەکۆمە ف تعاون گروهی.

**گەلە کۆمە کە:** گەلەکۆمە ف تعاون گروهی.

**گەلە کۆمە کی:** گەلەکۆمە ف تعاون گروهی.

**گەلە کۆمە گێ:** گەلەکۆمە ف تعاون گروهی.

**گەلە کۆیی:** خۆشاندان، پێکەوەڕۆیشتن بە کۆمەڵ ف تظاهرات.

**گەلە کی:** گەلەك، زاف، فرە، فریە، زۆر ف زیاد، بسیار.

**گەلـەمبـەری:** ١) بەگشتی؛ ٢) زۆربە؛ ٣) ڕیوشوێنی کۆمەڵگا ف ١) همگی؛ ٢) بیشتر، غالب؛ ٣) عُرف.

**گەلەندار:** داری زۆر ئەستوور ف درخت بسیار تنومند.

**گەلهۆ:** گەلحۆ ف تنومند احمق.

**گەلەوان:** شوانی پەزو گاڕان ف چوپان.

**گەڵەوان:** ئاگاداری دەوەن و بنچکان ف نگهبان درختچه‌های جنگل.

**گەلەور:** پواو، رزیو ف پوسیده.

**گەلهە:** نفوس: (**گەلهەیێ** کوردستانێ سی‌میلیۆنە) ف جمعیت.

**گەلی:** ١) سەربە کۆمەڵ؛ ٢) گەلی، بوهل ف ١) ملّی؛ ٢) دَرّه.

**گەلێ:** ١) زۆر، فرە، زاف؛ ٢) کۆمەڵەخەڵکێکی هاوڕەچەك ف ١) بسیار؛ ٢) ملّتی.

**گەڵی:** دۆڵ، دەرە، شیو، بوهل ف دَرّه.

**گەلیار:** عەشیرەتێ زل لە کوردستان ف عشیره‌ای بزرگ در کردستان.

**گەڵیاوا:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان کە بعثیان آن را ویران کردند.

**گەڵی بابۆلیا:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان کە توسط بعثیان ویران شد.

**گەڵی پساغا:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان کە توسط بعثیان ویران شد.

**گەڵی دێرا:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان کە توسط بعثیان ویران شد.

**گەلێر:** ١) زۆر، فرە؛ ٢) سەربە گەل ف ١) بسیار؛ ٢) ملّی.

**گەڵی ڕمان:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان کە توسط بعثیان ویران شد.

**گەڵیش:** ١) شارە، شادە، نیشانەی نێوان کاو خەرمان؛ ٢) گۆڵەمەرەزە ف ١) نشانۀ میان کاه و گندم در خرمن؛ ٢) کرد شالیزار.

**گەڵیشە:** گەلاشان ف نگا: گەلاشان.

**گەلێك:** ١) زۆر، زاف؛ ٢) کۆمەڵەخەڵکێکی هاوڕەچەك ف ١) بسیار؛ ٢) ملّتی.

**گەڵی گوێز:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان کە توسط بعثیان ویران شد.

**گەم:** ١) گرینگی، بایەخداری؛ ٢) گەمە، کایە ف ١) اهمّیّت؛ ٢) بازی.

**گەمــار:** ١) چرك، چڵك، پیسـاتی؛ ٢) چڵکن، پیس؛ ٣) دەباغی؛ ٤) گۆڵەسەگ ف ١) چرك، کثافت؛ ٢) چرکین؛ ٣) دبّاغی؛ ٤) سگ نر.

**گەمارگە:** دەباغ‌خانە ف دبّاغ خانه.

**گەمارۆ:** ١) شالاو، پەلامار؛ ٢) دەورەگیران ف ١) یورش؛ ٢) محاصره.

**گەمارۆدان:** ١) شالاوبردن، پەلاماردان؛ ٢) دەورەگرتن ف ١) یورش بردن؛ ٢) محاصره کردن.

**گەماڵ:** سەگی نێر، قەپەگۆڵ، گۆڵەسەگ ف سگ نر.

**گەمالان:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان کە توسط بعثیان ویران شد.

**گەماڵدو:** گیایەکە ف گیاهی است.

**گەماڵ فس:** قنگەڵتس ف چنباتمه.

**گەمانە:** گومانە ف نگا: گومانە.

**گەمباڵ:** گەماڵ ف سگ نر.

**گەمبـۆڵ:** ١) گۆڵـەسەگی پیر؛ ٢) برێتی لە زۆرپیری موی توێڵ و بروّ چەرمگ ف ١) پیر سگ نر؛ ٢) کنایه از آدم کهنسال.

**گەمبۆڵە:** گەمبۆڵ [ف] نگا: گەمبۆڵ.

**گەمر:** ناحەز لەبەر چاو، نەجوان [ف] زشت‌نما.

**گەمـڕ:** ۱) لەت، پارچەی ورد؛ ۲) نیوەکوڵا ن، نیوەجۆشان [ف] ۱) خُرد، تکهٔ کوچك؛ ۲) نیم‌جوش.

**گەمراندن:** ناشیرین کردن، کرێت کردن [ف] بدنما کردن.

**گەمڕاندن:** ۱) لەت و کوت کردن، وردو خاش کردن؛ ۲) کەمێك کوڵا ندن [ف] ۱) خردوله کردن؛ ۲) کمی جوشاندن.

**گەمڕە:** ۱) کەمرە؛ ۲) پترۆی برین [ف] ۱) سرگین خشکیدهٔ سفت؛ ۲) خشك ریشه.

**گەمـڕەبـەستن:** ۱) پتـرۆ نیشتنەسەربرین؛ ۲) برێتی لە چڵکنی زۆر: (دەستت ناشۆ ی **گەمڕەی بەستوە**) [ف] ۱) کپره بستن زخم؛ ۲) کنایه از چرکینی زیاد.

**گەمژ:** چکۆڵەی پوُتەکەی بێ‌نموت [ف] کوچولوی بدقیافه.

**گەمـژە:** ۱) گەمژ؛ ۲) حۆل، گەوج، گێژ، وڕ [ف] ۱) نگا: گەمژ؛ ۲) گیج، دبنگ، هالو.

**گەمژەڵ:** گەمژە [ف] نگا: گەمژە.

**گەمش:** ۱) پڕی دەستێ، گولم؛ ۲) ملانێ، زۆرەبانێ؛ ۳) لێدان بەدار [ف] ۱) پریك کف؛ ۲) کُشتی؛ ۳) چوبکاری.

**گەمشـانـدن:** ۱) لێدان؛ ۲) کوشتن لەژێر دارکـاریدا [ف] ۱) زدن؛ ۲) کُشتن در اثر چوبکاری.

**گەمشۆ:** ۱) خۆل، حۆل؛ ۲) زۆرانباز [ف] ۱) هالو؛ ۲) کُشتی‌گیر.

**گەمۆر:** ۱) تفت، ئاماڵ‌تاڵ؛ ۲) روگرژ [ف] ۱) گس مایل به تلخ؛ ۲) ترش‌رو.

**گەموُرە:** خۆراکی لیچق کە بە لێوەوە دەنوسێ [ف] غذای لزج که بر لب چسبد.

**گەمـە:** ۱) گاڵتە، ۲) قومار لەسەر بردنەوە؛ ۳) بازی؛ ۴) کایە: (**گەمە** بکە) [ف] ۱) شوخی؛ ۲) قمار؛ ۳) بازی؛ ۴) نوبت در بازی و قمار.

**گەمـەکا:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد [ف] نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**گەمی:** کەشتی، پاپۆڕ [ف] کَشتی.

**گەمێ:** گەمی [ف] کَشتی.

**گەمی‌وان:** کەسێ کە کەشتی داژوێ [ف] ناخدا.

**گەمێوان:** گەمی‌وان [ف] ناخدا.

**گەمیە:** گەمی، کەشتی، پاپۆڕ [ف] کَشتی.

**گەمیەوان:** گەمی‌وان [ف] ناخدا.

**گەن:** ۱) بۆن‌ناخـۆش؛ ۲) رزین لە تەڕاییدا؛ ۳) خراپ و بێ‌نرخ؛ ۴) کاری کرێت؛ ۵) گەرچـەك: (دۆنی **گەنی** نابت ڕۆن/ قەرەچی نابت خاتـوُن) «مـەسـەل»؛ ۶) تیخ و تەوری کول و نەبـڕ [ف] ۱) بدبو؛ ۲) پوسیدن از خیسی؛ ۳) بنجـل و بی‌ارزش؛ ۴) کارزشت؛ ۵) گَرچك؛ ۶) تیغ و تَبَر کُند.

**گەنار:** بۆن‌ناخۆش [ف] بدبو.

**گەنـــان:** ۱) رزین؛ ۲) زۆرگەیشتن: (**میوە گـەنـان**) [ف] ۱) لهیدن؛ ۲) زیادرسیدن میوه.

**گەناندن:** رزاندن لە تەڕاییدا [ف] پوسانیدن.

**گەنانن:** گەناندن [ف] پوسانیدن.

**گەنـاو:** ۱) تالاو؛ ۲) رزیو لە تەڕایی؛ ۳) گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد [ف] ۱) مرداب؛ ۲) پوسیده از نم؛ ۳) نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**گەناور:** جانەوەری وردیلە [ف] حشرات.

**گەناوەر:** گەناور [ف] حشرات.

**گەنج:** ۱) جحێڵ، لاو، جوان لە تەمەندا، خۆرت؛ ۲) خەزێنەی نەغدینە [ف] ۱) جوان؛ ۲) گنج.

**گەنجاڵی:** ناوە بۆ پیاوان [ف] نام مردانه.

**گەنجایەتی:** رۆژگاری جوانی، خۆرتی [ف] دوران جوانی.

**گەنجە:** ۱) گاڵتەو گەپ، حەنەك؛ ۲) خەڵوەتی، ژوُری رسق و کەل‌پەل؛ ۳) ناوی پیاوانە [ف] ۱) شوخی و بازی؛ ۲) پَستو؛ ۳) نام مردانه.

**گەنجـەفە:** ۱) قسەی تیزپێ‌کردن؛ ۲) پەڕی قومار؛ ۳) بازی بە پەڕی قومار [ف] ۱) حرف مسخره‌کردن؛ ۲) ورق قمار؛ ۳) بازی با ورق.

**گەنجی:** خۆرتی، جوانی [ف] جوانی.

**گەنجینە:** ۱) خەزێنە؛ ۲) ژوُرێ کە شتی بەنرخی ناوماڵی لێ دادەنێن [ف] ۱) گنج، گنجینه؛ ۲) اتاق ویژهٔ اثاث قیمتی.

**گەنجینەوان:** خەزێنەدار [ف] خزانه‌دار.

**گەند:** گەن [ف] نگا: گەن.

**گەندار:** مەشکەی لەدار یان تەنەکە، نێرە [ف] مَشك چوبی یا حلبی.

**گەنداو:** تالاو، زەلکاو [ف] مرداب.

**گەندڕ:** ۱) بۆگەن؛ ۲) گەنیو [ف] ۱) بوی گند؛ ۲) گندیده.

**گەندلخە:** گەمار، چڵکن و پیس [ف] چرکین، کثیف.

**گەندم:** دەغڵی بژیوی زوربەی خەڵك جگە لە برنج و جۆ [ف] گندم.

**گەندمە:** بالوُکە [ف] زگیل.

**گەنـدمی:** ۱) بەڕەنگی گەنم، ئەسمـەر؛ ۲) جۆرێ ترێ‌ڕەشکە [ف] ۱) گندمی رنگ؛ ۲) نوعی انگور سیاه.

**گەندوگو:** ۱) شتی پیس و پۆخڵ؛ ۲) زبڵ و زاڵ [ف] ۱) کثافت؛ ۲) آت آشغال.

**گەندوگەمار:** ۱) شتی پیس و پۆخڵ؛ ۲) زبڵ و زاڵ [ف] ۱) کثیف و بوگند؛ ۲) آت و اشغال.

**گەندوگەوەڵ:** گەندوگەمار [ف] نگا: گەندوگەمار.

**گەندە:** ۱) رزی، رزیو؛ ۲) پلۆخاو، پلیشاو؛ ۳) ناتەواو؛ ۴) خراپ [ف] ۱) پوسیده؛ ۲) لهیده؛ ۳) ناقص؛ ۴) بد.

**گەندەپەڵە:** پەڵەی ناتەواو [ف] باران موسمی ناکافی.

**گەندەپیاو:** نامەرد، بێ‌غیرەت [ف] نامرد.

**گەندەتا:** تاو لەرزی سقك [ف] تب سبك.

**گەندەخۆر:** پیس‌خۆر، کەسێ کە خۆراکی خراپ دەخوا [ف] بدخوراك، کسی که غذای بد می‌خورد.

**گەندەدەڵەك:** فسۆس [ف] حیوانی است بسیار بدبو.

**گەندەژن:** ژنێ زۆر لە وەخت پیر بێ ف زنی کە دچار پیری زودرس شود.

**گەندەژە:** ڕێوی تولەك کردو ف روباه پشم ریخته.

**گەندەکار:** کەسێ کە لە کاردا زانا نیەو خراپی دەکا ف ناشی.

**گەنـدەڵ:** ١) تەمـەڵ؛ ٢) نەفام؛ ٣) چروك و بێ کەڵك ف ١) تنبل؛ ٢) بی‌شعور؛ ٣) بی مصرف.

**گەندەڵ:** داری ڕزیو ف درخت پوسیده.

**گەندەلۆ:** گیایەکە لە کەما دەکا. *ئاژەڵ بیخوا کوێر دەبێ* ف گیاهی است سمّی.

**گەندەمۆ:** وردەموی زەرد کە دەوەرێ و موی لەجێ دەڕوێتەوە ف موی زرد نخستین که بعداً می‌ریزد.

**گەندەنێ:** خەفتانێك بارانی کەمی لێ ببارێ و تیشەی وشك بێ ف کشتهٔ دیمی کم باران.

**گەنکاو:** ئاوی بۆگەنیو ف گنداب.

**گەنکاوە:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**گەنکەزەردە:** گیابۆگەنیوە ف گیاهی است بدبو.

**گەنگەڵ:** گۆنگەڵ ف نگا: گۆنگەڵ.

**گەنم:** گەندم ف گندم.

**گەنم‌درەو:** دروێنەی گەنم ف دروگندم.

**گەنم‌دونە:** ١) دانوی گەنم؛ ٢) دانوڵەی تێکەڵاو لە هەموو دانەوێڵەیێ بۆ خێری ددان‌هاتنی زاروك ف ١) گندم آب پز؛ ٢) آش دندانی.

**گەنم‌ڕەنگ:** گەندمی، بەڕەنگی گەنم، ئەسمەر ف گندم‌گون.

**گەنم‌زۆردە:** فەریکەگەنم ف گندم درمل.

**گەنم گردی:** لەسەریەك بێ‌ڕاوەستان: (**گەنم گردی** دایگرت بە داران) ف بدون وقفه.

**گەنم گەنم:** گاڵتەیەکی شەونشینی‌یە ف نوعی بازی شب‌نشینی.

**گەنم گەنمێن:** بازی گەنم‌گەنم ف نگا: گەنم‌گەنم.

**گەنم‌وجۆ:** ١) موی ماش و برنج؛ ٢) ڕەشبەڵەك ف ١) موی جو گندمی؛ ٢) نوعی رقص گروهی.

**گەنمـۆك:** ١) گوڵەپێغەمبەرە، شامی، گوڵەگەنم، زوڕات، سەرداری؛ ٢) گیادۆکلیویکە ف ١) بلال؛ ٢) گیاهی است آشی.

**گەنمە:** گەندمە، بالۆکە ف زگیل.

**گەنمەبرێشکە:** گەنمی لەسەر ساج بۆدراو ف گندم بوداده.

**گەنمەبەهارو:** تۆمەگەنمێکە لە بەهاردا دەچێنرێ، بەهارو ف گندم بهاره.

**گەنمەبەهارە:** گەنمەبەهارو ف گندم بهاره.

**گەنمەپێغەمبەرانە:** گەنمۆك ف بلال.

**گەنمەپێغەمبەرە:** گەنمۆك ف بلال.

**گەنمەحۆلە:** جۆرێ گەنمی دەنك درشتە ف نوعی گندم درشت.

**گەنمەزەردە:** جۆرێ تۆمی گەنم ف نوعی گندم.

**گەنمەشام:** گەنمۆك ف بلال.

**گەنمەشامی:** گەنمۆك ف بلال.

**گەنمەقەندەهاری:** جۆرێ گەنم ف نوعی گندم.

**گەنمەکوێستانی:** جۆرێ گەنم ف نوعی گندم.

**گەنمی:** گەنم‌ڕەنگ ف گندمی رنگ.

**گەنو:** ١) برشاوی، کەڕاوی؛ ٢) بۆگەن لە ترشاوی ف ١) کفك زده؛ ٢) تُرشیده.

**گەنوس:** چکوس، ڕەزیل، ڕژد، پیسکە، سەقیل ف خسیس.

**گەنە:** ١) گەندە؛ ٢) کەوگی ف ١) نگا: گەندە؛ ٢) کنه.

**گەنـەدار:** ١) گیایەکی باڵا بەرزی گەڵاپـانە؛ ٢) دارێکە بەتازەیی زۆر جوانەو بەپیری خواروخێچە ف ١) گیاهی است؛ ٢) درختی است.

**گەنەك:** گیای گەرچەك ف گیاه کرچك.

**گەنەکار:** گەندەکار ف نگا: گەندەکار.

**گەنەکەولە:** کەوگی درشت ف نوعی کنهٔ درشت.

**گەنـەگـولـە:** جۆرێ گەنە کە بە ماڵاتەوە دەنوسێ ف نوعی کنه که به حیوانات می‌چسبد.

**گەنەگەنە:** دەرمانێکە لە تێکوڵی دارێکی دەوەنی دەگیرێ دژی تاو لەرزە ف گنه‌گنه.

**گەنەلۆ:** گەندەلۆ ف گیاهی است سمّی.

**گەنەم:** گەنم، گەندم ف گندم.

**گەنەمە:** گیایەکە بەرێکی هەیە دەیدەن بەگا ف گیاهی است که ثمرش را به گاو میدهند.

**گەنەی:** گیاگەرچەك، گەنەك ف گیاه کرچك.

**گەنی:** ١) بۆگەن؛ ٢) ڕزیو لە تەڕاییدا؛ ٣) بۆگەن‌بوو ف ١) بدبو؛ ٢) گندیده؛ ٣) گندید.

**گەنیگ:** گەنی ف نگا: گەنی.

**گەنین:** ١) بۆگەن‌بوون؛ ٢) ڕزین لە شەدا ف ١) بدبوشدن؛ ٢) گندیدن.

**گەنیو:** گەنی ف نگا: گەنی.

**گەو:** ١) ئاڵقـە؛ ٢) بەنـدی پەنجەو قامیش و...؛ ٣) گاو، تێلی لە شکاو بەستراو؛ ٤) گا؛ ٥) زنجی سەرنەپوشراو بۆ ئاژەڵ ف ١) حلقه؛ ٢) بند انگشت و نی و...؛ ٣) بش چینی شکسـتـه؛ ٤) گاونـر؛ ٥) محـوطـه محصور برای نگهداری دام.

**گەوا:** ١) گەڤا، شایەت؛ ٢) قورمساغ، دەویت ف ١) گواه؛ ٢) قرمساق.

**گەواد:** دەویت ف قرمساق.

**گەوارا:** چاوپۆشی، بەخشین لەخەتا ف چشم‌پوشی.

**گەوارە:** پەڵەهەور ف لکه ابر.

**گەواشـە:** پوش و چرۆی کە بەسـەر میچی دادەدەن، هەڵاش ف سقف پوش از گیا و ترکه.

**گەواڵ:** ١) پەڵەهەور، گەڤاڵە؛ ٢) حەپۆل، کەم‌ئاوەز ف ١) لکه ابر؛ ٢) هالو، نفهم.

**گەواڵ گەواڵ:** پەڵەپەڵەی هەوران ف لکه‌های متعدد ابر.

**گەواڵە:** پەڵەهەور، گەوارە ف لکه ابر.

**گەوان:** گونـدێکی کوردستـانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در

کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**گەواه:** گەوا، گەڤا، شایەت ف گواه.

**گەواهی:** شایەتی ف گواهی.

**گەوبەند:** گرێپشت ف ستون فقرات.

**گەوبەندە:** گەوبەند ف ستون فقرات.

**گەوج:** بێئاوەز ف اَبله.

**گەوجە:** عەلوکەی بەهارە ف گوجەسبز.

**گەوجەگەوج:** قسەی زۆرو بێتام ف وراجی، یاوه گویی.

**گەوجی:** بێئاوەزی، دەبەنگی ف حماقت، ابلهی.

**گەوچن:** هەرچی بەئـــاڵقـە چنـدرابێ: (عـەرەب **گەوچن** یان کردۆتـە جەوشەن بە زرێ دەڵێن) ف حلقه‌چین، بافت حلقه‌یی.

**گەوخان:** خنکان لەبەر تەنگەنەفەسی ف خفگی در اثرتنگی نفس.

**گەوخاندن:** بە تەنگەنەفەسی تووش بوون ف ابتلا به تنگی نفس.

**گەودە:** ١) گەدە؛ ٢) لەشی مرۆ ف ١) نگا: گەدە؛ ٢) جسم آدمی.

**گەور:** ١) سپی ئامالزەرد؛ ٢) رەنگی کەوە؛ ٣) ئاورپەرست؛ ۴) ئەسمەر، گەنمڕەنگ؛ ۵) زل، مەزن؛ ۶) زەردی خورمایی؛ ٧) هۆزێکی کوردە ف ١) سفـید مایل به زردی؛ ٢) توسـی؛ ٣) گَبْــر، زرتـشتـی؛ ۴) گندمگون؛ ۵) بزرگ؛ ۶) خُرمایی رنگ؛ ٧) نام عشیره‌ای است کُردزبان.

**گەوڕ:** تەویلە، پشتێر ف اصطبل.

**گەوران:** ١) دەشتێکـە لە کوردستـان لای دیاربـەکر. نەوتی هەیە؛ ٢) هۆزێکـە. *مامـۆستـا عەلی سەیدو لەوانـە*؛ ٣) گونـدێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف ١) منــطقـه‌ای نفتخیز در کردستــان؛ ٢) نام طایفـه‌ای است کُردزبـان؛ ٣) نام روستـایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**گەوراندن:** سپی کردنەوە ف سفیدکاری.

**گەوڕز:** گیایەکی بەلکبان و بەری بە قۆزاخەیە ف گیاهی است.

**گەورك:** ١) جۆرێ پەزی دوگەقولە؛ ٢) ناوی عەشیرەتێکی کوردە ف ١) نوعی گوسفند؛ ٢) نام عشیره‌ای است.

**گەوڕك:** ١) گیایەکــە وشتـــری پێ قەڵـــەو دەبێ؛ ٢) جۆرێ هەرمێ؛ ٣)بۆری ئامالسپی؛ ۴) موی سەرهەڵوەرین ف ١) گیاهی است؛ ٢) نوعی گُلابی؛ ٣) خاکستری روشن؛ ۴) ریزش موی سر.

**گەورکـــان:** ئەو ناوچـەی عەشیرەتی گەورکی لێ دەژین ف منـطقـهٔ عشیرهٔ «گەورك».

**گەورکایەتی:** گەورکان ف نگا: گەورکان.

**گەورگە:** تەپڵی زەلام ف طبل بزرگ.

**گەورۆ:** ١) پیاوی سپیپێست؛ ٢) ناوە بۆ پیاوان ف ١) مرد سفیدپوست؛ ٢) نام مردانه.

**گەورۆك:** کیژی گەنمڕەنگ ف دختر گندمگون.

**گەورۆنە:** کاورای زل ف آن بزرگه.

**گەورە:** ١)زل، زەلام؛ ٢) پایەبەرز؛ ٣) سەرۆك، رەئیس؛ ۴) پیر، بەتەمەن؛ ۵) موخـورمایی؛ ۶) مۆبۆر ف ١) کلان؛ ٢) بزرگوار؛ ٣) سردار؛ ۴) سالخورده؛ ۵) موخُرمایی؛ ۶) موخاکستری.

**گەورەبـــوون:** ١) باڵاکـــردن؛ ٢) زارۆکـی بەجێهێشتن؛ ٣) پلەو پایە بەرەژوورچوون ف ١) نموکردن؛ ٢) از بچگی گذشتن؛ ٣) بلندپایه شدن.

**گەورەچۆڵ:** قەرتاڵەی دەسکداری ناسك ف سبد دسته‌دار نازك.

**گەورەدێ:** لەو گونـــدانـەی کوردستـانـە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**کەورەك:** ١) موزەردی ئامالسوور؛ ٢) بۆری بەڕەنگی بەرزۆ ف ١) موزرد مایل به سرخ؛ ٢) خاکستری.

**گەورەکـچ:** ١) کیژێ کە دەمی شوکـردنی هاتوە؛ ٢) قەیرەکچ ف ١) دختر بالغ؛ ٢) دختر تُرشیده.

**گەورەم:** ١) سەرۆکی من، ئاغـام؛ ٢) من پیرم؛ ٣) زەلامم ف ١) آقای من؛ ٢) من پیرم؛ ٣) من بزرگم.

**گەورەمار:** ماری زل ف افعی.

**گەورەماڵ:** خانەدان ف خانوادهٔ بزرگ.

**گەورەیماڵ:** سەرۆکی خێزان ف سردار خانواده.

**گەورەیی:** ١) سەرداری، سەرۆکـــی؛ ٢) زەلامـی؛ ٣) بارسـت: (بـــە **گەورەیی** ئەم بەردە) ف ١) سرداری؛ ٢) بزرگی؛ ٣) حجم.

**گەوری:** ١) گەرو، قورگ؛ ٢) سپێنەی هێلکە ف ١) گلو؛ ٢) سپیدهٔ تخم‌مرغ.

**گەورێ:** ١) ژنی سپیپێست؛ ٢) ناوە بۆ ژنان ف ١) زن سپیدپوست؛ ٢) نام زنانه.

**گەوریك:** نەخۆشیەکی قورگە ف ازبیماریهای حنجره و گلو.

**گەورێلە:** مەلێکە، جۆرێ فرنندەیە، باڵدارێکە ف پرنده‌ای است.

**گەوریە:** گەورگە، تەپڵی زەلام ف طبل بزرگ.

**گەوز:** ١) گەڤز، دروێنەی پڕی داسێك؛ ٢) گاز بە ددان، قەپ، گەز؛ ٣) پڕحـــەشـــامـــەت: (جـڤـــات گەوزە)؛ ۴) شاد، دڵـخـــۆش؛ ۵) روخسارەچرچاو؛ ۶) گەش‌وشلك ف ١) نگا: گەڤز؛ ٢) گازدندان؛ ٣) شلوغ؛ ۴) شاد؛ ۵) رُخسار چروکیده؛ ۶) شاداب.

**گەوزان:** گەڤزان ف نگا: گەڤزان.

**گەوزاندن:** گەڤزاندن ف نگا: گەڤزاندن.

**گەوزدان:** تل‌خواردن لەسەر تەنشت ف برپهلو غلتیدن.

**گەوزکەوتا:** ڕەنـگ‌پەڕیـو، پەژمەریـو، سیس‌وژاکاو ف رنگ پریـده و پژمرده.

**گەوزکەوتە:** گەوزکەوتا ف رنگ پریده وپژمرده.

**گەوزلێدان:** پڕ بە داس دروونەوە ف پرداس درویدن.

**گەوزین:** گەوزان، گەڤزان ف نگا: گەڤزان.

**گەوش:** ١) سست؛ ٢) رژدوجنـۆك؛ ٣) ترسـەنـۆگ؛ ۴) گەش ف ١) سُست؛ ٢) خسیس؛ ٣) ترسو؛ ۴) شاداب.

**گەوشت:** ١) هەوایەکی گۆرانییە؛ ٢) تایبەتی ف ١) آهنگی است؛ ٢) خصوصی.

**گەوشـــەك:** ١) سەرلـــێ‌شێواو، سەرگەردان؛ ٢) سســتو شل ف ١)

سرگردان؛ ۲) سُست.

**گەوشین:** تایبەتی [ف] ویژگی، خصوصیّت.

**گەوشینی:** بەتایبەتی [ف] به ویژه، مخصوصاً.

**گەوۆك:** ۱) چرۆی تازە پشکوتو؛ ۲) شڵخەمیش [ف] ۱) جوانهٔ تازه شکفته؛ ۲) نسل نوین زنبور عسل.

**گەوکەر:** گاوکەر، کەسێ کە چینیەشکاو پینە دەکا [ف] بشرن، چینی بندزن.

**گەولا:** گونـدێکی کوردستـانـە بەعسی کاولی کرد [ف] نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**گەولاز:** بڕوانە گەڵوازە [ف] نگا: گەڵوازە.

**گەوڵە:** جۆرێ جۆی هەشتڕیزە کە لە بەراو دەیچێنن: (**گەوڵەجۆ**) [ف] نوعی جو.

**گەون:** گوێنی [ف] گَوَن.

**گەونێ:** گونـدێکی کوردستـانە بەعسی کاولی کرد [ف] نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**گەوە:** ۱) نیوەجـەغـز؛ ۲) قەداوقـەدی کێو، بڕوار؛ ۳) بڵندیو نزمی لە زەمیندا [ف] ۱) نیم دایره؛ ۲) کمرهٔ کوه؛ ۳) بلندی و پستی در دشت.

**گەوەر:** ۱) بەردی زۆر بەنرخ؛ ۲) ناوە بۆ ژنان؛ ۳) دەشتی پانو بەرین [ف] ۱) گُهر، سنگ قیمتی؛ ۲) نام زنانه؛ ۳) صحرای وسیع.

**گەوەڕ:** ۱) پشتێر، تەویلە، گەوڕ؛ ۲) شکێر، کەلێنەشاخ [ف] ۱) اصطبل؛ ۲) شکاف کوه.

**گەوەزن:** گاکێوی، کەڵەکێوی [ف] گوزن.

**گەوەزە:** ۱) زەبەلاح؛ ۲) لەخۆبایی [ف] ۱) لندهور؛ ۲) مُتکبّر.

**گەوەك:** زەمینی پڕ لە بەرزاییو نزمی، گەوە [ف] زمین پراز بلندی و پستی.

**گەوەل:** لیکاوی دەم، تف [ف] لعاب دهن.

**گەوەن:** گەون، گوێنی [ف] گَوَن.

**گەوەند:** گەڤەندە، سەرسەری، بێشەرمو شەلاتی [ف] لات و لاأُبالی.

**گەوهەر:** گەوەر [ف] نگا: گەوەر.

**گەوهەرناس:** ۱) کەسێ لە نرخی گەوهەر دەزانێ؛ ۲) برێتی لە بنیادەمی زۆر زاناو دانا [ف] ۱) گوهرشناس؛ ۲) کنایه از دانشمند.

**گەهـ:** ۱) گە، بەندی قامكو قامیش؛ ۲) جومگە؛ ۳) جار، دەم؛ ۴) نۆرە، نۆگە؛ ۵) گە، پێچەقـانـدن؛ ۶) جێگە؛ ۷) کونەبەراز [ف] ۱) بندنی و انگشت؛ ۲) مچ؛ ۳) گاه؛ ۴) نوبت؛ ۵) امتناع از رفتن؛ ۶) جای؛ ۷) سوراخ گُراز.

**گەهان:** ۱) پێگەیشتن: (میوە **گەهایە**)، ڕەسین؛ ۲) ناردراو گەیشتن بە دەست کەسێ کە بۆی هاتوە [ف] ۱) رسیدن میوه؛ ۲) رسیدن پیك.

**گەهاندن:** ۱) ناردراو بە خاوەنبوُن؛ ۲) ڕەسیەکردنی میوەو دەغڵو... [ف] ۱) رسانیدن فرستاده؛ ۲) رسانیدن میوه و...

**گەهراندن:** ۱) تۆرانن، قەهرپێدان؛ ۲) ئازاردان [ف] ۱) قهردادن؛ ۲) آزردن.

**گەهریك:** کارژیلە [ف] بزغالهٔ نوزاد.

**گەهگر:** گەگر، پێچەقێن [ف] امتناع کننده از رفتن.

**گەهە:** گەی قامکان، بەندیتبل [ف] بند انگشت.

**گەهەك:** ڕەبەت، سیپە [ف] کمین شکارچی.

**گەهیشتن:** ڕەسین [ف] رسیدن.

**گەهیشتی:** ڕەسیو [ف] رسیده.

**گەهین:** گەهیشتن [ف] رسیدن.

**گەی:** ۱) گە، پێچەقـانـدن؛ ۲) توری لە زماندا، قسەبۆنەهاتن [ف] ۱) اعتصاب از رفتن؛ ۲) لکنت زبان.

**گەیا:** شینایی کە لە زەمین دەڕوێ، شینکە، گیا [ف] گیاه.

**گەیاندن:** گەهاندن [ف] رسانیدن.

**گەیشتن:** گەهیشتن [ف] رسیدن.

**گەیشتوُ:** گەهیشتی [ف] رسیده.

**گەیشتی:** گەهیشتی [ف] رسیده.

**گەیگ:** گەهیشتی [ف] رسیده.

**گەیگر:** گەگر [ف] امتناع کننده از رفتن.

**گەیگە:** گەهەك، ڕەبەت، سیپە [ف] کمین شکارچی.

**گەیگیر:** گەگر [ف] نگا: گەگر.

**گەین:** گەیشتن [ف] رسیدن.

**گەینەوە:** ۱) گەیشتنە ئەو شوێنەی کە لێوە ڕۆیشتوُن؛ ۲) گەیشتنە کەسێ کە لە ڕێدا پێش کەوتـوە؛ ۳) سەر بەیەکـەوەنـانی لارەوەکراو [ف] ۱) وارسیدن؛ ۲) رسیدن به پیشتاز؛ ۳) به هم رسیدن هردوسر جسم خم شده.

**گەینـــەوەیەك:** ۱) هەردو سەری چەمێنـراو تێکـەڵبوُن؛ ۲) بەیەکتـر گەینەوە پاش لێك دوُرکەوتنەوە [ف] ۱) به هم رسیدن هردو سر چیزی؛ ۲) وصال دوباره پس از مدتها دوری.

**گەیوُ:** ۱) گەهیشتی؛ ۲) دومەڵی نەرمبوُگ [ف] ۱) رسیده؛ ۲) دُمَل نرم شده.

**گەیەنـەیڕەش:** گونـدێکـە لە کوردستـان بەعسی وێرانی کرد [ف] از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**گی:** گوُ، پیسایی بنیادەم [ف] مدفوع.

**گێ:** ۱) گوێ؛ ۲) گ، گش، تێکڕا؛ ۳) پاشگری بەواتا: گایەر: (شێتی عاقڵ گێ) [ف] ۱) گوش؛ ۲) همه؛ ۳) پسوند به معنی کنندهٔ جماع.

**گیئاسارە:** گوڵەستێرە، ئەستێرۆك، گوەستێرە [ف] کرم شب‌چراغ.

**گیا:** گەیا [ف] گیاه.

**گیائادەمە:** گیایەکە بنکەکەی لە بیچمی بنیادەمە بۆ دەرمان دەشێ [ف] مردم گیاه، استرنگ.

**گیابڕ:** کرمێکە لە گیا دەنیشێو ئەگەر ئاژەڵ بیخوا پێ دەمرێ [ف] کرمی است سمّی که برگیاه نشیند و دام را مسموم کند.

**گیابڕبوُن:** بە گیابڕ مردنی ئاژەڵ [ف] مرگ حیوان به وسیلهٔ «گیابڕ».

**گیابـڕنـك:** کەسێ کە گیای دەرمـان کۆدەکـاتەوە [ف] کسی که گیاهان دارویی را جمع‌آوری می‌کند.

**گیابرین:** گیایەکە بۆ دەرمانی برین دەشێ [ف] گیاهی است داروی زخم.

**گیابۆگەنە:** گەنکەزەردە [ف] گیاهی است بدبو.

**گیابۆگەنیوە:** گیابۆگەنە ف نگا: گیابۆگەنە.

**گیابەرانـە:** گیایەکی پتەوی باڵابەرزە لە چیغھۆنیندا بەکار دێت ف گیاهی است قدبلند کە در ساختن چیغ از آن استفادە می‌کنند.

**گیابەرك:** گیایەکی لاسك‌کلۆری بەرزە. *گوڵی زەردو بۆن خۆشە* ف گیاه درمنە.

**گیابەن:** گیایەکی زۆر بۆن‌خۆشە ف گیاهی است خوشبوی.

**گیابەند:** گیابەن ف نگا: گیابەن.

**گیابەنیشت:** ۱) گیاچەقە؛ ۲) شیرەی بنی شنگ ف ۱) گیاه قندرون؛ ۲) شیرهٔ گیاهی است.

**گیاپرچ:** گیایەکی بەپنجی زۆر گەڵاباریکی لێك‌هاڵاوە ف گیاهی است.

**گیاترکە:** گیادوکڵیوێکە ف گیاهی است آتشی.

**گیاجاڕ:** جێگەیە کە زۆری گیا لێ ڕواوە ف مرغزار.

**گیاچا:** گیایەکە بۆی دەدەن و لە جیاتی چا دەمی دەکەن ف گیاهی است بە جای چای استعمال می‌شود.

**گیاچنارە:** گیایەکە بۆ دەرمان دەشێ و برین دەبرژێنێتەوە ف گیاهی است دارویی.

**گیاچەقە:** گیایەکە شیرەی وەك بنێشت دەجوُن ف گیاه قندرون.

**گیاخۆر:** جانەوەری پێچەوانەی گۆشت‌خۆر ف جانور گیاهخوار.

**گیاخوُن:** گیایەکە شیرەکەی سوُرە. *ماڵاتی پێ زۆر قەڵەودەبێ* ف گیاهی است با شیرهٔ سرخ.

**گیاداروك:** گیایەکـە گوڵی زەردەو تامی تاڵـە. *بۆ دەرمان بەکاردێ و میز رەوان دەکا* ف گیاهی است دارویی.

**گیادانو:** گیایەکە لە تیرەی جاترەکێویلە ف گیاهی است از تیرهٔ نعناعی‌ها.

**گیادانە:** گیایەکە گوڵی شین دەکاو زۆر لەوەڕی چاکە، مێرۆورد ف گیاهی است با گُلهای آبی.

**گیادوپشـك:** گیایەکـە بۆ دەرمـانی دوپشـك‌پێوەدان ف گیاهی است داروی عقرب گزیدگی.

**گیاڕەش:** جەنگەی بەهارو گیای زۆر ف عنفوان بهار.

**گیارەنج:** بەڵای قۆزاخەپەمۆ ف آفت غوزە.

**گیاڕەنگ:** گیایەکە ڕەنگی زەردی کاڵی لێ پەیدا دەکەن ف گیاهی کە رنگ کاهی از آن گیرند.

**گیاڕیش:** گیایەکە ف گیاهی است.

**گیاڕیشالۆك:** گیایەکی دەشتی و لەتیرەگیای لەوەڕە ف گیاهی است علفی.

**گیاریفك:** گەسك، گزگ، گێزك ف جارو.

**گیاڕێقینگ:** گیایەکە لەتیرەی وەنەوشە ف نوعی بنفشە.

**گیاز:** ۱) جیازی بوُك؛ ۲) کورتـانی حوشتـر ف ۱) جهاز عروس؛ ۲) جهاز شتر.

**گیازاقا:** گیایەکە ف گیاهی است.

**گیازراقك:** گیای مێرگان ف گیاهی است.

**گیازەنگلۆك:** گیایەکـە بەرەکـەی لەزەنگـوڵەی پچوُك دەکا ف گیاهی است ثمرش شبیه زنگولە.

**گیاسارمە:** گیایەکە بۆ دەقاقی چیت دەبێ ف گیاه سلمە.

**گیاسالمە:** گیاسارمە ف گیاه‌سلمە.

**گیاسپی:** گیایەکە بۆ دەرمانی برین دەبێ ف گیاهی است داروی زخم.

**گیاسەدر:** گیایەکی کوڵکنی‌دەشتەکی یە ف گیاهی است.

**گیاشلە:** گیایەکی وردیلەیە بەزەویەوە نوساوە بەردەس ناکەوێ ف گیاهی است کە بر روی زمین می‌خوابد.

**گیاقـاپـوُشك:** گیایەکە نێرتکی لە شەیتانۆکەی زیندو دەکا ف گیاهی است ثمرش شبیه حلزون.

**گیاکتك:** گیایەکە پشیلەزۆر حەز لە بۆنەکەی دەکا ف علف گربە، سنبل الطیب.

**گیاکرمۆك:** گیایەکی دەشتیە ف از گیاهان علفی است.

**گیاکندر:** گیایەکە لە پرزەکەی کندر دروس دەکەن ف کنب، کنف.

**گیاکوریشك:** گیایەکی پڕو بەرزەباڵای خوارە ف گیاهی است.

**گیاکوڵکنە:** گیایەکە بۆ دەرمان دەشێ ف گیاهی است دارویی.

**گیاکەتان:** گیایەکی باڵابەرزە ف گیاه کتان.

**گیاکەتك:** گیاکتك ف علف گربە.

**گیاکەفە:** ئەسپوُن ف اشنان، چوبك.

**گیاکەڵە:** کەڵە، کیرکەڵە ف انگل بلای توتون و پالیز.

**گیاکەن:** ۱) کەسێ کە گیا لە زەوی دەکەنێ؛ ۲) پیشکان ف ۱) گیاه‌کن؛ ۲) ابزار گیاه کندن.

**گیاکەنان:** سەروبەندی گیاکەندن، بڕانەوەی بەهارو سەرەتای هاوین ف موسم گیاه کندن.

**گیاکەوڵە:** گیایەکە بەرلە هەموُگیا دەڕوێ و بەرلە هەموان زەرد دەبێ ف گیاهی است کە قبل از تمام گیاهان سبز می‌شود و قبل از همە هم زرد می‌شود.

**گیاگرێچك:** گیایەکە دەرمانی زك‌وێستان و برینە ف گیاه هفت‌بند.

**گیاگەزوك:** گەزگەزك ف گیاه گزنە.

**گیاگەسك:** گیایەکی بەرزەباڵایەو تووێکی وەك هەرزن دەگرێ. *جگە لە گەسکەشاریە* ف گیاه جارو.

**گیاگێزك:** گیاگەسك ف گیاه جارو.

**گیاگێسك:** گیایەکی گوڵزەردی زۆر تاڵە ف گیاهی است.

**گیاگێلە:** گیاشلە ف نگا: گیاشلە.

**گیالاقا:** بەڕەزا ف گیاهی است.

**گیالاوە:** بەڕەزا ف گیاهی است.

**گیامار:** گیایەکە دەرمانی ماران‌گەستەە ف گیاهی است پادزهر نیش مار.

**گیامسك:** گیایەکی زۆر بۆن‌خۆشە ف گیاهی است خوشبوی.

**گیامێش:** ۱) بێژان؛ ۲) گوڵی داودی ف ۱) گیاهی است صحرایی؛ ۲) گل داوودی.

**گیامێشوُلە:** گیایەکە وەك سێسو بۆ باقەبێن دەبێ ف گیاهی است برای بستەبندی علوفە بە کار می‌رود.

**گیان:** ۱) روح، جان؛ ۲) بەدەن: (هەمو گیانم ژان دەکا)؛ ۳) جوابە بۆ

زۆر خۆشەویست: (**گیان** چیت وت؟)؛ ۴) خوایشت: (**گیان** دەوەرە) ف ۱) جان؛ ۲) کالبد؛ ۳) جواب محبت‌آمیز، جانم؛ ۴) خواهش.

**گیان‌ئەسپاردن:** روح دەرچوُن ف جان سپردن.

**گیاندار:** زیندو ف زنده.

**گیان‌بەخش:** گۆری، خۆبەقوربان‌کەر ف جانباز در راه عقیده.

**گیان‌بەدەستەوەدان:** ۱) روح‌دەرچوُن؛ ۲) بریتی لە سازان‌و کونجان: (**گیان بەدەستەوە نادا، گیانی دا بە دەستەوە**) ف ۱) جان سپردن؛ ۲) کنایه از سازش در معامله.

**گیان‌بەر:** ۱) پێمێردی خودا؛ ۲) بریتی لە ئازا لە جەنگ ف ۱) عزرائیل؛ ۲) کنایه از شجاع.

**گیاندان:** روح دەرچوُن ف جان سپردن.

**گیان‌دەبەر:** زیندو ف زنده.

**گیان‌سپاردن:** روح دەرچوُن ف جان سپردن.

**گیان‌سوُز:** بەسام، بەهەیبەت ف هولناك.

**گیان‌سەخت:** ۱) سەرسەخت، نەسازاو؛ ۲) زیندوێ کە لە ڕوح‌دەرچوندا درەنگ دەکا: (دەزانی بۆ لە دوُری تۆ نەمردم/ کە من سەگ‌مەرگم‌و **گیان**سەختو دلڕەق) «شێخ‌ڕەزا» ف ۱) دیرساز در معامله؛ ۲) دیرمیر، جان سخت.

**گیان‌کەندن:** ۱) روح‌کێشان؛ ۲) روح دەرچوُن ف ۱) میرانیدن؛ ۲) مردن.

**گیان‌کەنشت:** دەمی روح‌دەرچوُن ف هنگام نَزع.

**گیان‌کەنن:** گیان‌کەندن ف نگا: گیان‌کەندن.

**گیان‌کەنکە:** ئیزرایل، پێمێرد، فرشتەی گیان‌کێشان ف عزرائیل.

**گیانکی:** کاریێ کە شێخ‌و مەلا دەیکەن ف روحانیّت.

**گیان‌کێش:** پێمێرد ف عزرائیل.

**گیان‌کێشان:** گیان‌دان ف جان دادن.

**گیان‌لەبەر:** زیندو، گیان‌دەبەر ف زنده.

**گیانە:** ئەی خۆشەویستم ف جانا.

**گیانەسەر:** جاڕز، نارەحەت ف پکر، ناراحت.

**گیانە گوینە:** دوامین پشو ف آخرین رمق.

**گیانەڵا:** دەمی ئاویلکەدان، دەمەدەمی روح‌دەرچوُن ف حالت نَزع.

**گیانەڵاو:** گیانەڵا ف حالت نَزع.

**گیانەمەژگ:** مێشکێ کە لەناو ئێسکی ئەندامانی لەش دایە ف مغز استخوان.

**گیانەوەر:** زیندو، جانەوەر ف جانور.

**گیانی:** بەسنی‌دۆستی زۆر خۆشەویست ف دوست بسیار عزیز، جانی.

**گیانێ:** گیانە، وشەی دواندنی زۆر خۆشەویست ف جانا.

**گیانی گیانان:** ۱) بریتی لە خودا؛ ۲) بریتی لە گراوی ف ۱) کنایه از خدا؛ ۲) کنایه از معشوق.

**گیانی گیانی:** گیانی: (دۆستی **گیانی گیانی**) ف دوست جانی.

**گیاوەردێنە:** گیایەکە بۆ دەرمانی چاوێشە دەبێ ف گیاهی است داروی چشم درد.

**گیاهوُێنك:** گیایەکە بۆ دەرمان دەشێ ف گیاهی است دارویی.

**گیایی:** ۱) بەڕەنگی گیا؛ ۲) کەسێ کە جگەلە گیا ناخوا ف ۱) به رنگ گیاه؛ ۲) گیاهخوار، آدم گیاهی.

**گیپ:** گوُپ ف لپ.

**گیپا:** کیپار ف سیرابی آکنده از قیمه و برنج، نگا: کیپار.

**گیپار:** کیپار، گیپا ف نگا: کیپار.

**گیپاڵ:** عوُر، زگی سەر ڕێخۆڵەدان ف شکم بالای شکمبه.

**گیپن:** ۱) گوُپن؛ ۲) کورتەباڵای قەڵەو ف ۱) لُپ برآمده؛ ۲) کوتاه‌قد چاق.

**گیپنە:** گیپن ف نگا: گیپن.

**گیپە:** گیپا ف نگا: کیپار.

**گێبەڕ:** ۱) ئەستوُرایی ئەستۆ؛ ۲) کۆتەرە ف ۱) کلفتی گردن؛ ۲) قطر.

**گێبەڕە:** گێبەڕ ف نگا: گێبەڕ.

**گیت:** باو بۆران، توُف ف دمه وطوفان.

**گێت:** گوێچکەت، گوێی تۆ ف گوش تو.

**گیتاڵ:** تیتۆڵ، بزگوڕ ف لته‌پارهٔ فرسوده.

**گیتر:** ۱) شەل بە هەردولادا؛ ۲) لەتەر، بەلەك؛ ۳) ئێسکی بەلەك ف ۱) لنگ از هر دوپا؛ ۲) ساق؛ ۳) استخوان ساق.

**گینك:** گیتر ف نگا: گیتر.

**گێتکە:** کیتکە، کولێرەی هەرزن ف گردهٔ ارزن.

**گیتە:** ئاڵۆدار، داریێ کە بەسەر کاریتەدا ڕادەکێشرێ ف الوارهای سقف.

**گێتە:** ۱) گێتکە؛ ۲) بەرگ‌شڕ، روُت‌و نەدار ف ۱) گرده نان ارزن؛ ۲) ژنده‌پوش و بینوا.

**گیتەڵە:** تەشقەڵە ف شلتاق.

**گیتێ:** کولێرە ف گردهٔ نان.

**گێتی:** دنیا، جیهان ف گیتی.

**گیج:** ۱) کەسێ کە وڵات لەبەر چاوی خول دەخوا؛ ۲) سەرسوڕماو؛ ۳) گەچ ف ۱) گیج؛ ۲) متحیّر؛ ۳) گچ.

**گێج:** گیج ف نگا: گیج.

**گێجاو:** گەرداو ف گرداب.

**گێج‌خواردن:** ۱) سەرگێج‌بوُن؛ ۲) سوُڕانی باو ئاو بە دەوری خۆیاندا ف ۱) گیج شدن؛ ۲) چرخش باد و آب.

**گێج‌دان:** سوُڕاندن ف چرخاندن.

**گێجەبا:** گەردەلوُل، باهۆز ف گردباد.

**گێجەگێج:** دنیا لەبەرچاوسوُڕان ف سرگیجه.

**گێجەلوُکە:** باهۆز، گەردەلوُل، گێجەبا ف گردباد.

**گێجەنە:** گرێژەنە، بازنەدەرگا ف پاشنهٔ در.

**گێجی:** ۱) سەرسوُڕان؛ ۲) نەخۆشیەکە ف ۱) گیجی؛ ۲) بیماری سرگیجه.

**گیچ:** گوێژ، بلج، گفیشك ف زالزالك.

**گێچ:** گەچ ف گچ.

**گێچکار:** گەچکار ف گچکار.

**گێچکاری:** گەچکاری [ف] گچکاری.

**گێچکە:** ١) گوێچکـە، گوێ؛ ٢) گێـج خواردن [ف] ١) گـوش؛ ٢) نگا: گێج خواردن.

**گێچەڵ:** گەڕ، دەبە، شڵتاغ، تەشقەڵە [ف] شلتاق.

**گێچەڵی:** کەلوی خوری [ف] آغندهٔ پشم.

**گێچینـە:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد [ف] نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**گیدۆ:** باهۆز، گێجەڵۆکە [ف] گردباد.

**گێدوك:** ١) گەوە؛ ٢) ڕێ بەگەوەی کێفدا [ف] ١) کمر کوه؛ ٢) مسیر در کمرکوه.

**گیر:** ١) بەرهـەڵـست؛ ٢) خۆراکێ کە بە سانـایی قوت ناچێ؛ ٣) ڕژد، چکوس؛ ۴) پەتی حەیوان بەستنەوە؛ ۵) پاشگری بەواتا: گر، شتێ کە دەگرێ [ف] ١) مانع؛ ٢) خوراك گلوگیر؛ ٣) خـسیس؛ ۴) رسن دام بند؛ ۵) پسوند فاعلی به معنی گیرنده.

**گیڕ:** ١) چیر، بەقەوەت؛ ٢) بەکێش؛ ٣) زۆرویژ؛ ۴) ڕەق لە سەودادا؛ ۵) فاڵ، خیرە؛ ۶) ملە، کەل؛ ٧) شیوەڵەی نێوان دوکێف؛ ٨) بەردەڵان [ف] ١) نیرومنـد؛ ٢) کشـدار؛ ٣) وراج؛ ۴) سرسخت در معامله؛ ۵) فال فالبین؛ ۶) گردنه؛ ٧) درّه؛ ٨) سنگلاخ.

**گێر:** ١) بست؛ ٢) کونی بەرداش؛ ٣) قەڵەوی پان و پۆڕ؛ ۴) حەپەساو؛ ۵) ئەوی لە جێ چەقیوە و توانـای بزوتنـەوەی نەمـاوە [ف] ١) وجب؛ ٢) سوراخ سنـــگ آسـیا؛ ٣) چاق و پهن؛ ۴) حیرت‌زده؛ ۵) کسی که برجای خود میخکوب شده و توان حرکت ندارد.

**گێڕ:** ١) خوار و خێج؛ ٢) گیڕ؛ ٣) سمت لەجێ چوگ؛ ۴) سوڕێن: (ئاوی ئاشگێڕ)؛ ۵) دروسکەر و سازدەر: (بەزمگێڕ، کارگێڕ، شوڕشگێڕ)؛ ۶) خلۆر [ف] ١) کج و ناهمـوار؛ ٢) نگا: گیڕ؛ ٣) لگن از جا دررفته؛ ۴) چرخاننده؛ ۵) گرداننده وسازنده؛ ۶) غلتان از بالا.

**گیرا:** ١) قبوڵ بونی دوعا: (دوعای **گیرا** بوە)؛ ٢) ڕابردوی گرتن، گرا [ف] ١) استجابت دعا؛ ٢) گرفته‌شد.

**گێراز:** بەلاڵوکەکێویلە [ف] آلبالوی کوهی.

**گێراف:** لاسا، دەمەلاسکە، لاسایی [ف] تقلید.

**گیرام:** ١) وام دانا، گرتم؛ ٢) دەگیر کەوتم [ف] ١) فرض کردم، گیرم؛ ٢) گرفتار شدم.

**گیران:** ١) گرفتاربون؛ ٢) بەسترانی ڕێگەی شتی تراو؛ ٣) گری کرن؛ ۴) ڕەش داگەڕانی مانگ و ڕۆژ؛ ۵) نەخۆشی گرفت [ف] ١) گرفتارشدن؛ ٢) گیرکـردن، بنـدآمـدن؛ ٣) گریستن؛ ۴) خسـوف و کسـوف؛ ۵) بیماری اِمتلا.

**گێڕان:** ١) گەڕانـــدن، گەردش پێ کردن؛ ٢) کارپـــێ کردن و بەســـەر ڕاگەیشتن؛ ٣) سەربـان بە باگردان شێلان؛ ۴) پەستاوتنی بەرگن بۆ ڕایەخ و پەستەك؛ ۵) خلۆرکردنەوە، شاتلۆرە؛ ۶) وەپاش خستن [ف] ١) به گردش بردن؛ ٢) به‌کار انداختن؛ ٣) غلتك زدن بام؛ ۴) پامال کردن نمد؛ ۵) غلتاندن؛ ۶) به تأخیر انداختن.

**گیراندن:** گریاندن [ف] به گریه انداختن.

**گێڕاندن:** ١) گەڕاندن؛ ٢) کارپێ کردن [ف] ١) گردش دادن؛ ٢) به‌کار انداختن.

**گێڕانـــدنـەوە:** ١) گەڕانـدنـەوە؛ ٢) باس کردنی قسـەی گوتـراو؛ ٣) حیکایەت گوتن [ف] ١) بازگرداندن؛ ٢) بازگو کردن؛ ٣) داستان گفتن.

**گێڕانن:** گێڕاندن [ف] نگا: گێڕاندن.

**گێڕاننەوە:** گێڕاندنەوە [ف] نگا: گێڕاندنەوە.

**گێڕانەوە:** گێڕاندنەوە [ف] نگا: گێڕاندنەوە.

**گێرانی:** شەیتان پێ کەنیو، باڵغ بوگ [ف] بالغ شده، به سن رُشد رسیده.

**گێرانی بون:** شەیتانی بون، باڵغ بون [ف] بالغ شدن، به سن رُشد رسیدن.

**گیراو:** ١) گراو، گرفـتـــار؛ ٢) ڕێگــە بـــەستـــراو؛ ٣) مانـــگ و ڕۆژی ڕەش هەڵگەڕاو؛ ۴) یەکسمی تازە فێرە بار و زین کراو [ف] ١) گرفتار؛ ٢) راه سدّ شده؛ ٣) آفتاب و ماه گرفته؛ ۴) ستور تازه رام شده برای بار و زین.

**گیراوردە:** پەیداکراو [ف] پیداشده.

**گیراوە:** ١) تێکەڵ کراوی چەند شتێ؛ ٢) خاك و ئاوی کراو بە قوڕ [ف] ١) درهم آمیخته برای دوا؛ ٢) گل سرشته.

**گێڕایش:** ١) گەڕیدەیی؛ ٢) لەشـــوێن گەڕان بۆ پەیداکـــردن [ف] ١) جهانگردی؛ ٢) جستجو.

**گیربون:** ١) وێستان بەشتێکەوە؛ ٢) نەڕۆیشتن و مانەوە لە شوێنێ [ف] ١) گیر کردن به چیزی؛ ٢) ماندگار شدن در جایی.

**گێڕبـون:** ١) خوار و ناقـوڵابـون؛ ٢) ئێسکی ڕان ترازان [ف] ١) کج و ناهموار شدن؛ ٢) استخوان ران دررفتن.

**گیرچ:** بلچ، گوێژ، گفیشك، گوهیشك [ف] زالزالك.

**گیرخستن:** ١) گرتن؛ ٢) دەست خستن [ف] ١) گیرانداختن؛ ٢) پیدا کردن.

**گیرخواردن:** گرفتاربون [ف] گیرافتادن.

**گیردان:** ڕاگرتن و لە ڕۆیشتن گێڕانەوە [ف] معطّل کردن و از کار مانع شدن.

**گیرزان:** فاڵگرەوە [ف] فالبین.

**گیرسان:** گرسان [ف] نگا: گرسان.

**گیرسانەوە:** بەندبون لە شوێنێ [ف] بند شدن به جایی.

**گیرستن:** گرین، گری کرن [ف] گریستن.

**گیرسك:** کرۆسك [ف] گلابی وحشی.

**گیرفان:** بەریك، بەرك، جێو [ف] جیب.

**گێرڤان:** کەسێ کە گاو گۆل لە خەرمان کوتاندا لێ دەخوڕێ [ف] متصدّی خرمن کوبی.

**گێرك:** ١) مێروەزەردەی ورد؛ ٢) مرۆچە، مێرولە [ف] ١) مورچهٔ زرد ریز؛ ٢) مورچه.

**گێڕك:** گێژاو [ف] گرداب.

**گیرکـــردن:** ١) گیردان، وێستـــانـــدن لە ڕۆین؛ ٢) شتێ بە شتێکـەوە قایم کردن: (دەستی لێ **گیرکرد**) [ف] ١) گیردادن؛ ٢) چیزی را محکم به چیز دیگر بستن.

**گێرکە:** گێرك ف مورچهٔ زرد ریز.

**گیرکەوتن:** دەس کەوتن ف به دست آمدن.

**گیرگـە:** ١) ددانی پێشین: (**گیرگەی نەماوە پیر بوە**)؛ ٢) جێگەیێ کە شتی لێ گیر بێت؛ ٣) ئامرازی خوارکردنەوەی دار بۆ کۆچان و کەمە ف ١) ناب، دندان پیشین؛ ٢) جای گیرکردن چیزی؛ ٣) ابزار خم کردن چوب.

**گێرم:** شوروا، شۆربە ف شوربا.

**گێرما:** گەرما، دژی سەرما ف گرما.

**گێرمەکیش:** کێشەکێش ف کشاکش.

**گێرمی:** شێوی دانۆلە ف آش گندم.

**گیرنـەدەر:** کەسێ کە ناتـوانێ ترۆ تس ڕاگرێ ف کسی که نتواند باد شکم را حبس کند.

**گیرۆ:** پەتا، نەخۆشیەك کە خەڵك دەگرنەوە ف بیماری واگیردار.

**گیرودار:** بگرەو بەردە ف گیرودار.

**گیرۆدە:** ١) گرفتار؛ ٢) هۆگر، ئۆگر، خوُ پێ گرتو، ئالوُدە؛ ٣) ئەڤیندار ف ١) گرفتار؛ ٢) انس گرفته؛ ٣) عاشق.

**گیرۆدەیی:** ١) گرفتاری؛ ٢) ئۆگری ف ١) گرفتاری؛ ٢) علاقەمندی.

**گێرۆسە:** دەستاڕ، کڕە ف دستاس.

**گێرۆشە:** گێرۆسە ف دستاس.

**گیروگرفت:** گرفتاری ف گیروگرفت.

**گێروفەن:** شیاوی، ژیهاتویی ف لیاقت، قابلیّت.

**گیرۆیی:** ١) گرفتـاری؛ ٢) گرتنـەوەی نەخۆشی ف ١) گرفتاری؛ ٢) سرایت بیماری.

**گیرە:** ١) شەددە؛ ٢) جەرۆ مەنگەنەی پیشەسازان؛ ٣) گیرگە، کەڵپ؛ ٤) کورسی قورعان؛ ٥) ئامرازی درگا لەپشتەوە داخستن جگە لە قفلّ؛ ٦) نانی تێکەڵاو لە گەنم و هەرزن و جۆ؛ ٧) ئاڵقەی بەن لە ڕەشماڵدا بۆ گوریس پێ قایم کردن؛ ٨) گرفتاری؛ ٩) ئامرازێکی جۆلاّیی ف ١) تشدید بر حرف؛ ٢) منگنه؛ ٣) نگا: گیرگه؛ ٤) رحله قرآن؛ ٥) رزهٔ در از داخل؛ ٦) نان آمیخته از گندم و ارزن وجو؛ ٧) حلقه‌های سیاه چادر؛ ٨) گرفتاری؛ ٩) از ابزار بافندگی.

**گێڕە:** ١) چەقەکردن و چەنەلێدانی زۆر؛ ٢) شڵتاغ، تەشقەڵە، گەڕ ف ١) روده درازی، وراجی؛ ٢) شلتاق.

**گێرە:** ١) وردکردنی دەغڵ و گیا بە پێ لێنان و شێلانی حەیوانات؛ ٢) گلی، شکایەت؛ ٣) گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف ١) کوبیدن گیاه و غلّه وسیلهٔ حیوانات، خرمنکوبی؛ ٢) گِله، شکایت؛ ٣) نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**گێرەشێوێن:** بریتی لە ئاژاوەچی، فتنە ف آشوبگر.

**گێرەڤان:** گێرڤان ف متصدّی خرمن کوبی.

**گێرەکردن:** ١) بە سم کوتانی دەخڵ و گیا؛ ٢) بریتی لە هاتوچۆ بەسەر قوڕدا کردن ف ١) کوبیدن خرمن؛ ٢) کنایه از رفت وآمد زیاد در گل.

**گیرەم:** وام دانا، گرتم، گریم کرد ف فرض کردم، گیرم.

**گێرەنەکەر:** بریتی لە تەمەڵ ف کنایه از تنبل.

**گێرەوان:** گێرڤان، گێرەڤان ف نگا: گێرڤان.

**گێرەوکێشە:** ١) کلۆش بردنەسەر خەرمان و گێرەکردنی؛ ٢) گرفتاری، دەردەسەری ف ١) سپاری بەخرمن بردن و کوبیدن؛ ٢) گرفتاری.

**گێڕەوە:** ١) هەرچی بەر لە ڕۆیشتن دەگرێ؛ ٢) پارێزەر: (**بەلاّ گێڕەوە**)؛ ٣) کەسێ باری ڕوُداو یان بێژراو دوپـاتە دەکاتەوە: (**قسە گێڕەوە**) ف ١) مانع؛ ٢) محافظ؛ ٣) بازگوکننده.

**گیرەوە:** گیرۆدە ف نگا: گیرۆدە.

**گیرهـە:** ١) بۆقی ئاوی ڕەق بوُگ، تەمـان، بلغ ف رسوب سفت شدهٔ درون آب.

**گێرەیقوڕێ:** کوتانی جێ جێخۆن بەهۆی گاگەل ف جای خرمن را با سُم دامها کوبیدن.

**گیری:** تامی گەروُگر ف مزهٔ گلوگیر.

**گێڕی:** ١) خوار و خێچـی؛ ٢) شەلـین بە هەردولادا ف ١) کجی و ناهمواری؛ ٢) لنگیدن از دوپا.

**گیریاگ:** گیراو ف گرفتار.

**گیریان:** ١) گیران، گری کرن، گرین؛ ٢) گیرهـاتن، دەگیرکەوتن؛ ٣) کپ بوُن ف ١) گریستن؛ ٢) گرفتار شدن؛ ٣) مسدود شدن، گرفتگی.

**گیریست:** گری، گریان ف گریه.

**گیرین:** گرین، گری کرن ف گریستن.

**گیرێ:** گونـدێکی کوردستـانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**گیز:** ١) گوێز، گرتـەکان، قۆز، گوُز، گوز؛ ٢) پشتەستۆ، بۆق مل؛ ٣) پرچ، کەزی، کەزیە؛ ٤) دەنگی باریك وەك دەنگی سەماوەروکەتری؛ ٥) دەنـگی ڕۆیشتنی گوللە: (**بـە گیزە گیز ڕۆیشت**)؛ ٦) تەلـەس، مەست، سەرخۆش؛ ٧) ڕاتڵەکان، ژانی مەشکە ف ١) گردو؛ ٢) پشت گردن؛ ٣) گیسـو؛ ٤) صدای نازك مانند صدای سماور؛ ٥) صدای رفتن گلوله؛ ٦) مست؛ ٧) بهم‌زنی مایع.

**گێز:** ١) گوێز؛ ٢) پشـتەستـۆ: (**گـێزی ملیم گرت**)؛ ٣) بەراوردو لێکدانـەوە بە بیر و خەیاڵ؛ ٤) تەفرە، دەستـاوەدەست؛ ٥) ڕیشوی شەدەو مێزەر ف ١) گردو؛ ٢) پشـت گردن؛ ٣) حدس و تخمین؛ ٤) امروز وفردا کردن در اجرای وعده؛ ٥) شرابه، منگولهٔ عمامه.

**گیزان:** گوێزان ف اُستره.

**گێزان:** ١) کیان، کەی، ڕاتڵەکـانی تراو لە دەفـردا؛ ٢) گوێزان، تیخی موُتاش ف ١) به هم زده شدن مایع؛ ٢) اُستره.

**گێزبەلۆك:** بزنەڕیشە، جۆرێ شنگی پەلكدرێژ ف نوعی شنگ.

**گێزبەلە:** ئاڵەکۆك ف گیاهی است.

**گێزر:** تەفرەدەر، دەستاوەدەست پێکەر ف کسی که دروعده امروز و فردا می کند.

**گیزك:** ئیسوّت، بیبار ف فلفل.

**گێزك:** گەسك، گزگ ف جارو.

**گیزگیزە:** مزراح، مزراق ف گردنا.

**گیزلی:** گوزلی ف نگا: گوزلی.

**گێزوگوڵنگ:** ڕیشی‌و گوڵنگەی سەرو مێزەر ف شرابه و منگوله.
**گێزوگوڵنگە:** گێزوگوڵنگ ف شرابه و منگوله.
**گێزوگوڵینگ:** گێزوگوڵنگ ف شرابه و منگوله.
**گێزوگوڵینگە:** گێزوگوڵنگ ف شرابه و منگوله.
**گیزە:** ۱) دەنگی باریکی ئاوکوڵان لە دەفری تەنگا: (**گیزەی سەماوەر**)؛ ۲) دەنـگـی ڕۆیشـتـنی گولله؛ ۳) دەنگی مێش ف ۱) صدای چون جوشش آب در سماور؛ ۲) صدای عبور گلوله؛ ۳) صدای مگس.
**گێزە:** ۱) بە سەبروکە گۆرانی گوتن لە خۆشیان، سۆزە: (**گێزەی دێت**)؛ ۲) بریتی لە کورتەباڵای قەڵەو ف ۱) ترنّم از شادی؛ ۲) کنایه از کوتاه قدّ چاق.
**گێزەر:** ۱) گزر؛ ۲) گیایەکی بن‌سپی گوڵ‌وەنـــەوشـە ف ۱) هویج؛ ۲) گیاهی است ساقه‌سپید با گل بنفش.
**گێزەرتەر:** گیایەکە بۆ ڕەوانی باشە ف گیاهی است مُسهل.
**گێزەرە:** پشت گەردن، پشت ئەستۆ ف قفا، پشت گردن.
**گیزە گیز:** دەنگەدەنگی باریکی گوللەو مێش‌و سەماوەر ف صدای نازك پیاپی.
**گیزەڵ:** بنیادەمی دایم‌قەڵس‌و جاڕز ف آدم عصبی.
**گێزەمل:** مل‌ئەستوُر ف گردن کلفت.
**گێزی:** گزك، گەسك ف جارو.
**گیزین:** ۱) گژەی‌با؛ ۲) دەنگی گەڵا کە با دەیشەکێنێ ف ۱) صدای تُند باد؛ ۲) صدای حرکت برگها از وزش باد.
**گێژ:** گێج ف نگا: گێج.
**گێژاف:** گێجاو ف نگا: گێجاو.
**گیژاڵ:** قرژاڵ، قرژانگ، کیفژاڵ ف خرچنگ.
**گێژاو:** گێژاف ف گرداب.
**گێژبوُن:** گێج‌بوُن ف گیج شدن.
**گێژدان:** ۱) گێج‌دان؛ ۲) پاکـەوەکـردنی دەخـڵ بە بێژنگ ف ۱) نگا: گێج‌دان؛ ۲) بوجاری وسیلهٔ غربال.
**گێژك:** گەرداو، گێژاو، گەرداف ف گرداب.
**گێژکردن:** ۱) توُشی سەرسوُڕان کردن؛ ۲) دەغڵ بە بێژنگ پاك کردن؛ ۳) بریتـی لە چەقـــەی زۆر بۆکـــەسێ کردن ف ۱) گیج کردن؛ ۲) بوجاری کردن وسیلهٔ غربال؛ ۳) کنایه از ورّاجی و سر به‌دردآوردن.
**گێژکە:** پاکەوەکردنی خەلە بە بێژنگ ف بوجاری غلّه با بیزن.
**گێژکەر:** شتێ کە سەر توُشی سوُڕان دەکا ف گیج کننده.
**گێژڵوك:** گیایەکە ف گیاهی است.
**گێژن:** جێژن، جەژن، عەید ف عید.
**گیژن:** گێجەنە، گرێژەنە، پاژنەی درگا، بن ڕێسمانە ف پاشنهٔ در.
**گێژنۆك:** گوڵێکە لە سەرەبەهاردا دەپشکوێ ف گلی است.
**گێژۆك:** ۱) گێوژ، بلچ؛ ۲) داری گوێژ ف ۱) زالزالك؛ ۲) درخت زالزالك.
**گێژوویژ:** بێ‌هۆش، حۆل ف گیج و منگ.
**گێژەڕاو:** ڕاوە ڕێوی بەرلەبارانی پایز ف شکار روباه قبل از باران پاییز.
**گێژەڤانك:** باوەخولێ ف بازی به‌دور خود چرخیدن.

**گێژەگ:** ۱) خولخولە؛ ۲) گێژی ف ۱) فرفره؛ ۲) گیجی.
**گێژەگێژ:** چەقەی بێ‌تام‌و خوێ ف یاوه، ورّاجی.
**گێژەلوُکە:** باهۆز، گەردەلوُل، گێجەلوُکە ف گردباد.
**گێژەڵە:** گێژەلوُکە ف گردباد.
**گیژەلە:** بلچ، گوێژ، گێوژ، گڤیشك، گوهیشك ف زالزالك.
**گێژەنە:** گێجەنە، گیژن، گرێژەنە، بن ڕێسمە ف پاشنهٔ در.
**گێژەو:** گێژکە ف بوجاری با غربال.
**گێژەوانك:** گێژەڤانك، باوەخولێ ف بازی به دور خویش چرخیدن.
**گێژەوکراو:** لەبێژنگ‌دراوی خەلە ف غلّهٔ بوجاری شده، جاش.
**گێژی:** گێجی ف گیجی.
**گێژین:** گێژیەتی، گیژایەتی ف حالت گیجی.
**گیس:** پرچ، کەزی، گیز، پەلکە، پوُڕی سەر ف گیسو.
**گێست:** برسی، برچی، نێز ف گرسنه.
**گێستمەردش:** لەبرسان‌مردن ف از گرسنگی مردن.
**گیسك:** بەچکەبزنی لەشیر بڕدراو ف چپش، بزغالهٔ از شیر بریده.
**گیسْك:** کەزی، پرچ، پوُڕی‌سەر ف زُلف.
**گێسك:** ۱) گیسك؛ ۲) گێزك، گەسك، جاڕو، گسك، گزك ف ۱) چپش؛ ۲) جارو.
**گیسْك‌لیل:** کەزی‌لوُل‌و بەموێنج ف زلف فرفری و موجدار.
**گیسکـــەزا:** بێچـوی بزنێ کە بە بیژۆکی زاوە ف بزغـالـهٔ بزی که در دوسالگی زاییده است.
**گێسکەزاو:** گیسکەزا ف نگا: گیسکەزا.
**گیسکێ:** لەو گونـــدانـــەی کوردستـانـە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.
**گیسن:** گاسن ف گاوآهن.
**گێسن:** گیسن، گاسن ف گاوآهن.
**گیسنای:** پێ‌کردنی ئاگر، گڕتێ‌بەردان ف افروختن.
**گسنەچڕ:** گرێوەغار، ملەی ڕاکردن ف مسابقهٔ دو.
**گێسو:** کەزی، پرچ ف گیسو.
**گێسوانە:** گوێسوانە، پاسارە، سوانە ف لبهٔ بام.
**گێسوبڕی:** پوُڕکورکراو، بریتی لە ژنی خراپ ف گیسو بریده، کنایه از زن بدعمل.
**گیسەنە:** پێ‌کراوی ئاگر ف افروختگی.
**گیسی:** زنجیرەکێو ف رشته کوه.
**گێسی:** پرچ، کەزی، پوڕ ف گیسو.
**گێش:** پۆلی باڵداران لەحەوا ف دستهٔ پرندگان در حال پرواز.
**گێشت:** گوست، ئەموست، تبل، قامك، کشك ف انگشت.
**گیشتاقلینج:** قامکەتوُتە، تبلاگچکە ف خنصر، انگشت کوچکه.
**گیشتامیوێنەن:** زەڕنەقوُتە، تلیاناوین ف انگشت وسطی.
**گیشتن:** گەیشتن ف رسیدن.
**گیشتۆنە:** گشتانە ف نگا: گشتانە.
**گێشکـون:** بەکـۆمـەڵ‌فڕینی مەلان بەرەو گەرمێن‌و کوێستان ف کوچ

دسته‌جمعی پرندگان.

**گیشه:** ۱) کۆمەڵێ باقەی لەسەریەك داندراوی گیاو خەڵە لە دەشت؛ ۲) کۆمـای گەورەو زل لە باقـەگیا بۆ ئالفی زستانەی ئاژەڵ، تایە ف ۱) تودهٔ بستـه‌هـای غلّه یا گیاه درویده درمزرعه؛ ۲) تودهٔ انباشتهٔ گیاه برای علوفهٔ زمستان.

**گێشه:** گیشه ف نگا: گیشه.

**گیف:** ئامادەو تەیار ف آماده و مهیّا.

**گیفان:** گیرفان، بەریك، بەرك، جێو ف جیب.

**گیفك:** ۱) ڕیشوی شەدەو پێچ؛ ۲) ڕیشوی زین بۆ جوانی؛ ۳) پلکەی دەسمـاڵی ژنـانـه ف ۱) شرابـهٔ دستـار؛ ۲) شرابـهٔ زین؛ ۳) دنبالهٔ سربوش زنانه.

**گیفْك:** گۆفك، سەرانگوێلك ف شوله.

**گیفەلان:** گیفْك، گۆفك ف شوله.

**گیفەلانك:** گیفەلان، گۆفك ف شوله.

گیڤ: ۱) گیف؛ ۲) پێچ‌دراو، ڕیشوی بادراو ف ۱) مهیّا؛ ۲) شرابهٔ تابداده.

**گیڤاله:** ۱) دەستەمرۆیەك؛ ۲) تیپی سواران، دەستەسوار ف ۱) جمعی از انسانها؛ ۲) تیپ‌سواران.

**گیڤڕ:** گوربەپشیله ف گربهٔ نر.

**گیڤژاڵ:** کیڤژال، قرژانگ ف خرچنگ.

**گیڤژاڵه:** برجی قرژاڵ لە عاسمان ف بُرج سرطان.

**گیڤك:** گیفك ف منگوله.

**گیڤ گیڤه:** گیزگیزه، قوڕقوڕه ف گردنای توخالی شده.

**گیڤل:** ئیشتیای خواردن، واز لەخواردن ف اشتها.

گیڤه: ۱) بزوتنی سمێڵ لەخۆشیان؛ ۲) دەنگی بەردی بەتەوژم ئاویتراو ف ۱) جنبیدن سبیل از شادی، خندهٔ زیرلبی؛ ۲) صدای سنگ فلاخن.

**گی گلو:** قالۆنچەی ڕیخ‌گلێن ف سوسك سرگین گردان.

**گی گله:** گی‌گلو ف سوسك سرگین گردان.

**گیل:** هەڕك، قوڕ، هەڕ، حەڕی، خۆڵی بەئاو تەڕکراو ف گِل.

**گێل:** حۆل، کەم‌ئاوەز ف ابله، هالو.

**گێڵ:** ۱) گەشت، گەڕان؛ ۲) تەتەڵەکردن، هەڵتەکاندن، بۆ دەغڵ‌و توتنی دەڵێن ف ۱) گشت و گزار؛ ۲) طبق کردن.

**گێڵا:** گەڕیده، گەڕۆك ف گردش کننده.

**گێلاخه:** گیایەکه بۆ چێشت خۆشه ف گیاهی است خورشی.

**گێلاس:** ۱) میوەیەکه لە بەلاڵۆك دەکا بـەڵام شیرینەو زەردو سوورێشی هەیه؛ ۲) پیاڵـەی بادەخواردنەوه ف ۱) میوهٔ گیلاس؛ ۲) ساغر می، گیلاس میخوارگی.

**گێلاس:** گێلاس ف ۱) گیلاس؛ ۲) ساغر.

**گێلاسی:** چەرمی گلاسی ف نوعی چرم.

**گێلان:** ۱) گەڕان، گەڕیان؛ ۲) وڵاتێکـه لە ئێران: (بـرنجی ڕەشت و گێلانێ) ف ۱) گشت؛ ۲) منطقهٔ گیلان.

**گێلای:** گەڕیان، گەشت، گێلان ف گردش، گشت.

**گێلبزانه:** گیایەکه لە بەهاردا بەرلە گشت گیایەك سەر دەردێنێ ف گیاهی است که در بهاران پیش از هرگیاه دیگر سبز می‌شود.

**گیلك:** ۱) بەلۆکه، قیتکه؛ ۲) گوندێکی کوردستانه بەعسی کاولی کرد ف ۱) چوچوله؛ ۲) نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**گێلْك:** ۱) گۆلك، گوێلك، گوڕ؛ ۲) گیایەکه وەك سرێش ئەچەسپێ؛ ۳) خوری حازر بۆ ڕستن ف ۱) گوساله؛ ۲) گیاهی دارای مادهٔ چسپنده؛ ۳) آغندپشم.

**گێلکه:** جۆرێ میرولەی سوری چکۆله ف مورچهٔ قرمز ریز.

**گێلگێله:** ریزەگوڵینگـەی تێك‌خراو بۆ سەرو شەدەی ژنـان ف زنجیرهٔ منگوله‌های دستار زنانه.

**گێلو:** جۆرێ گێچکاری میچی خانو ف نوعی گچکاری سقف.

**گێلوەره:** لەو گوندانەی کوردستانه کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**گیله:** گله، گازنده ف گلایه.

**گێله:** حۆل، کەم‌فام ف اَبله، هالو.

**گێڵه:** گەڕیان، گەشت ف گردش.

**گیلەبەنا:** خـۆراکێکه لە ماستـو قەزوان ف خوراکی از ماست و نانکش.

**گێلەپەڕك:** مرۆچەی باڵدار، میرولەی باڵ‌لێ‌هاتگ ف مورچهٔ بالدار.

**گێلەخ:** گێلاخه ف گیاهی است خورشی.

**گێلەسی:** گوندێکه لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**گێلەشۆ:** زەنازەنا، چەقەچەق ف همهمه و جنجال.

**گێلەشۆك:** گێلەشۆ ف همهه و جنجال.

**گێلەك:** گونـدێکی کوردستـانه بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**گێلینـگ:** شەش‌داو شەش‌داوی لێك‌هاڵاو بۆ تەونی لەسـەر عەرز ف تارهای ششگانهٔ کلیم‌بافی افقی.

**گیم:** ۱) باقەبێن، باغەبێن؛ ۲) بەندی بەستنی باوەشێ لە دەغل ف ۱) نگا: باقەبێن؛ ۲) بَند بستن توده‌ای دروشده.

**گین:** ۱) پاشگرێکە خاوەنی دەگەیەنێ: (**خەمگین**)؛ ۲) پاشگرێکە پەسن دەگەیەنێ: (**دواگین**)؛ ۳) پاشگـری بەواتا: وەك، چون: (**گورگین**)؛ ۴) گوان: (**نوێنگین**) ف ۱) پسوند به معنی دارنده؛ ۲) پسوند وصفی؛ ۳) پسوند تشابه، مانند؛ ۴) پستان حیوان.

**گێن:** گوێن، وەك، لەتەرزی ف مانند.

**گیندال:** گیایەکه، گیادانه ف گیاهی است.

**گیندەڵ:** گیادانه ف گیاهی است.

**گینگڵ:** جینگڵ ف جنبیدن یواشکی.

**گینگەڵه:** خولیا، کەلکەڵه ف نگا: کەلکەڵه.

**گینۆ:** زەرتك، گیازەرتك ف گیاهی است از آن رنگ زرد گیرند.

**گێنه:** گەرچەك، گەنەك [ف] گرچك.

**گێنی:** گوێنی، گەون [ف] گَوَن.

**گێنیان:** هۆزێکی کوردە ژێردەستی ترکان [ف] نام طایفه‌ای کُردزبان.

**گیو:** ناوی پیاوانە [ف] نامی است مردانه.

**گێور:** گیڤر، گوریە [ف] گربهٔ نر.

**گێوژ:** کۆیژ، بلج، کقیشك [ف] زالزالك.

**گێوژەزەردە:** گۆیژی زەرد [ف] زالزالك زرد.

**گێوژەسوُرە:** گۆیژی سوُر [ف] زالزالك قرمز.

**گێۆل:** تاسەو تامەزرۆیی [ف] هوس و آرزو.

**گیوه:** ۱) کلاشی بن چەرم، کلاش؛ ۲) نۆرە، باو [ف] ۱) گیوه؛ ۲) نوبت.

**گیوه گیر:** نۆرەگر [ف] نوبت گیر.

**گیوه گیره:** نۆرەگری [ف] نوبت گیری.

**گیوه گیو:** گێژەگێژ، قسەی زۆر بێ تام [ف] تُرّهات، حرف مُفت.

گیه: گەدە، عوُر، کرش [ف] شکمبه، شکم برامده.

**گیهان:** گەیشتن [ف] رسیدن.

**گیهانەك:** قۆناغ، مەنزل: (**گیهانەك بگیهانەك دچو**) [ف] منزلگه.

**گیهەڤ:** ۱) بەش، پشك؛ ۲) بەخشیش [ف] ۱) حصه، نصیب؛ ۲) بخشش.

**گیێ داری:** جیوەی دارو درەخت [ف] انگُم درخت.

**گییرەیش:** گرەوتش [ف] نگا: گرەوتش.

**گییریایش:** گرەوتش [ف] نگا: گرەوتش.

**گیێ قامێر:** جیوەی دار بادام [ف] انگُم درخت بادام.

**گیێ گۆش:** چلکی گوێ [ف] ترشح گوش.

**لْ**: ١) ژ، جه، لەلایەن: (**ل** تە ڕا گەهایە من)؛ ٢) بۆ نزیك‌کردنە: (جلکی خۆ **ل** خۆ کە واتا: بیکە بەرت)؛ ٣) دەفری دەم‌و جێ دەگەیەنێ: (**ل** کو بوی؟، **ل** ڕۆژا پاشین)؛ ٤) بۆ حاڵی: (های **ل** من)؛ ٥) پاشگری بچـوُك‌شانـدان: (کا**کل**) ف ١) از؛ ٢) پیشوندی که نزدیك کردن را می‌رسانـدن؛ ٣) ظرفیت زمان و مکان؛ ٤) پیشوند به معنی از حال، برای حال و وضع؛ ٥) پسوند تصغیر.

**لا**: ١) ڕەخ، ئالی؛ ٢) نەسـازو سەرسـەخت: (کـابـرایەکی **لا**یە هەر ناسازێ)؛ ٣) توێ، ناو: (لۆکەم خستۆتە **لا**کەیەوە)؛ ٤) نیوە: (**لا**یەکی لە **لا**یەکی زلترە)؛ ٥) کن، نك، جەم: (نان وا **لا**ی منە)؛ ٦) دوُرەپەرێزو بێ‌تەرەف: (من لەو کارانە **لا**م)؛ ٧) فەرمان بە دوُرکەوتنەوە: (تۆخوا بە سەری خۆت **لا**)؛ ٨) خوار، خێچ: (مـن دەڵـێم سەرێکـی ئەم دیوارە **لا**یە)؛ ٩) نافەرمانی: (تۆ هەرچی بفەرموی من **لا**م‌نیە)؛ ١٠) یاریدە، ئاریکـار: (لـەم کێشـەدا من **لا**ی تۆ دەگرم، **لا**ی تۆم)؛ ١١) وتـەی بانـگ‌کردنی ژن لە لایەن مێردەوە، وەك ژنـەکێ؛ ١٢) شریتی قەند، کەندری زراف؛ ١٣) ئاوها، ئیتر، بەڵام؛ ١٤) شیو، دۆڵی تەنگ؛ ١٥) قڕقڕە، غەرغەرە، تەختەکلاف؛ ١٦) لافاو، سێڵاو، لەهی، لی، لێمشت ف ١) سو، جانب؛ ٢) لجباز و سرسخت؛ ٣) لایە؛ ٤) نیمە؛ ٥) نزد، پیش؛ ٦) کنارەگیر؛ ٧) دورشو؛ ٨) کج، ناهموار؛ ٩) نافرمانی؛ ١٠) یاری، مَدَد؛ ١١) لفظ خطاب مرد به زن؛ ١٢) نخ کلّە قند؛ ١٣) امّا؛ ١٤) درّهٔ تنگ؛ ١٥) قرقره؛ ١٦) سیلاب.

**لائین**: دەمەلاسکە ف ادای کسی درآوردن.

**لابا**: ١) بەباداکردنی خەلە بە بێژنگ؛ ٢) باپەنا، بانەگر؛ ٣) دوُر بخاتەوە: (ئـەگەر دیوارەکـە **لابـا** خـۆش دبـێ)؛ ٤) لایبـا، لایوا: (هـاتـوەمـاشێنـەکـە**لابـا**)؛ ٥) زبڵو زاڵێ کە لە بەبـاداکردنی خەلە خڕبۆتەوە ف ١) باددادن غلّە با غر بال؛ ٢) بادنگیر؛ ٣) دور کند؛ ٤) بردارد؛ ٥) آت آشغال حاصل از باد دادن غلّە.

**لابار**: ١) تابار، نیوەبار؛ ٢) خوارو نارێك: (ئەم کەلایە **لابار**ە)؛ ٣) بارەبەر بەکرێ‌دان بە نیوەی بارەکەی: (کەرەکەتم دەیە بە **لابار**خوێت بۆ دێنم) ف ١) لنگەبار؛ ٢) ناهموار و کج؛ ٣) کرایهٔ بار به محتوای لنگه‌بار.

**لاباری**: ١) کاری کرێ بە نیوەبار؛ ٢) خوارو خێچی؛ ٣) قیرسچمەیی‌و سەرسەختی ف ١) کرایهٔ لنگه‌باری؛ ٢) ناهمواری و کجی؛ ٣) سرسختی.

**لاباسك**: ١) نزیکەی دوند لەکەناری کێفدا؛ ٢) پاڕانەوەو لالانەوە ف ١) ستیغ کوه؛ ٢) توسل جُستن.

**لاباشە**: نانی تەنکی ساج ف نانِ ساج.

**لابـاڵ**: ١) باڵێکی باڵـدار؛ ٢) کەنـارەی باڵ؛ ٣) دەستێ؛ ٤) قەراغی دەستێك ف ١) یك بال؛ ٢) کنارهٔ بال؛ ٣) یك دست؛ ٤) کنارهٔ دست.

**لابان**: گەڕوگزی، فێڵ، حۆقەبازی ف حُقّه‌بازی.

**لابانتە**: بەرامە، بۆی‌خۆش ف نَکْهَت.

**لاباندن**: خاپاندن، کلاوسەرنیان، فریودان ف فریب دادن.

**لابـڕ**: ١) سەربڕ، لەڕێ‌لادان بۆ کورت‌بوُنەوەی ڕێگە؛ ٢) کوچکەئاورێ کە دیواری لە پێش نەبێ ف ١) میانبُر؛ ٢) اجاقی که جلوش باز باشد.

**لابردن**: ١) لـەسەرهەڵگرتـن؛ ٢) دوُرکردنـەوە ف ١) برداشتن؛ ٢) دورکردن.

**لابڕدنگ**: قسەی بەتێکوڵ، زیپك ف حرف تودار، متلك.

**لابرێ**: ١) ئەوساکە، ئەودەمی، ئەوکاتە؛ ٢) بەڵام ف ١) آن دفعە؛ ٢) لیکن.

**لابك**: ١) تەڵە، داو؛ ٢) تەپکە ف ١) دام، تلە؛ ٢) نگا: تەپکە.

**لابنێ**: ١) ئەوساکە؛ ٢) بەڵان ف ١) آن دفعە؛ ٢) لیکن.

**لابوُت**: ١) سەری ئاسنینی مەساسەی جوُتێر؛ ٢) ئاسنی پانی چەقاو بۆ قوڕی پێڵاوخاوێن‌کردنەوە ف ١) سرفلزی وسیلهٔ شخم‌زنی؛ ٢) آهن پهنی که در زمین فرو می‌کنند و گلهای کفش را بدان پاك می‌گردانند.

**لابوُن**: ١) کەنارەگیری، دوُرەپەرێزی؛ ٢) نەهاتنەسەرڕێ، سەرسەختی ف ١) کنارەگیری، بی‌طرفی؛ ٢) لج کردن.

**لابە**: ١) دوُر خەوە؛ ٢) دوُرەپەرێز بە؛ ٣) دەس هەڵگرە: (**لابە** تۆ نازانی کار بکەی) ف ١) بردار؛ ٢) کنارەگیر باش؛ ٣) دست بردار.

**لابەر:** ١) کەسێ کە شتێ دەداتە ئالی؛ ٢) کەسێ کە شتێ دەسترێتەوەو نای هێڵێ [ف] ١) کنارگذار، بردارنده؛ ٢) زداینده.

**لابەردەی:** لابردن [ف] نگا: لابردن.

**لابەرە:** ١) بەرەی زین؛ ٢) خەلاس بکە، مەهێڵە: (وەرە وەرە شەماڵ وەرە خەم لە دڵەکەی من **لابەرە**) [ف] ١) پیشبند زین؛ ٢) بردار، بزدای.

**لابەلا:** ١) خوارو خێچ؛ ٢) سەرسەختو نەگونجاو؛ ٣) چین لەسەر چین؛ ٤) قەدپاڵی کێو؛ ٥) خۆتێهەڵقوتێن؛ ٦) کەسێ کە لە نەخۆشیو ماندویی یان سەرخۆشی خوارەوخوار دەڕوا؛ ٧) خوارەکەو پێچەکەی ڕێگە [ف] ١) کج و ناهموار؛ ٢) لجباز؛ ٣) چین‌چین؛ ٤) کمرکوه؛ ٥) فضول؛ ٦) کسی کە تلوتلو می‌خورد؛ ٧) راه پر پیچ و خم.

**لابەلایی:** ١) خۆتێهەڵقوتێن؛ ٢) سەرسەختی؛ ٣) خوارو پێچی ڕێگە [ف] ١) فضول؛ ٢) لجبازی؛ ٣) پیچ و خم راه.

**لابەلێ:** ١) ئەودەم، ئەوڕۆژگارە، لابرێ، لابنێ؛ ٢) بەڵام [ف] ١) آن زمان؛ ٢) امّا، لیکن.

**لابیتە:** ١) داردەستی جوتیار لە شوبڕیندا کە سەرێکی کلکەبزمارو سەرێکی پیشکانە، مەساسە؛ ٢) پیشکانی گیاکەنی [ف] ١) چوبدست شخم زن؛ ٢) بیلچهٔ گیاه‌کنی.

**لاپ:** چەپۆك، بە پانایی دەست لە تەپڵەسەر دان [ف] توسری.

**لاپا:** قەدپاڵی کێو [ف] کمرکوه.

**لاپار:** ١) لاپا؛ ٢) سەرەوژوورەی زۆرد؛ ٣) سواپ [ف] ١) کمر کوه؛ ٢) سر بالایی سخت؛ ٣) شن صاف و نازك برای بازی.

**لاپاران:** سواپێن [ف] نوعی شن بازی.

**لاپارێن:** لاپاران، سواپێن [ف] نگا: سواپێن.

**لاپاڵ:** ١) قەدپاڵی کێو؛ ٢) تەنشت: (بێ لە **لاپاڵمەوە** بنیشە) [ف] ١) کمرکوه؛ ٢) پهلو، نزد.

**لاپاڵو:** خاڵیگە، برك [ف] تهیگاه.

**لاپان:** شتی خڕیلە کە تەواو خڕ نەبێ: (ئەو منداڵە سەری **لاپانە**) [ف] کره‌ای ناقص.

**لاپانك:** بن سوچی ڕەشماڵی هەڵدراو: ( فلان بێوەژن لە **لاپانکی** فلان ماڵ دایە) [ف] گوشهٔ برچیدهٔ سیاه چادر.

**لاپاو:** سێڵاو [ف] سیلاب، سیل.

**لاپچین:** پێڵاوی تا قولەقاپە، پۆتین [ف] پوتین.

**لاپرە:** کەس نەناس، بیگانە [ف] ناشناس، بیگانه.

**لاپرەسەن:** ١) لاپرە؛ ٢) خۆتێهەڵقوتێن [ف] ١) ناشناس؛ ٢) فضول.

**لاپرەسەنگ:** لاپرەسەن [ف] نگا: لاپرەسەن.

**لاپك:** لەپك [ف] دستکش.

**لاپلا:** ڕێگەی پڕ خوارەکەو پێچەکە، لابەلا [ف] راه پر پیچ و خم.

**لاپلار:** ١) خۆتێهەڵقوتێنی سەربەخۆ؛ ٢) قسەی بەتێکوڵ [ف] ١) ناخواندهٔ فضول؛ ٢) متلك.

**لاپلەرسەنگ:** لاپرەسەن [ف] فضول.

**لاپواز:** ١) لاپلار؛ ٢) پوازێکی بچوکە لەو سەری قەڵشاوی دار دەخرێ [ف] ١) فضول ناشناس؛ ٢) پغاز جانبی.

**لاپۆتی:** ڕەجاڵە، ڕوتەو پوتە [ف] رَجّاله.

**لاپۆرە:** لاپرە [ف] ناشناس، غریبه درمحل.

**لاپوشك:** چنگاڵ، چنگوڕك [ف] چنگال حیوان درّنده و پرندهٔ شکاری.

**لاپوڵە:** پڵپڵە، پیڵە [ف] سکه و مهرهٔ به‌رشته کشیدهٔ زینتی.

**لاپۆلی:** کورتەباڵای گۆشتن [ف] کوتاه‌قدِ چاق.

**لاپە:** نخۆشەر [ف] لپه.

**لاپەڕ:** ١) تاكو دوور لە ئاوایی: (خانوەکەیان **لاپەڕە**)؛ ٢) دوورەپەرێزو کەنارەگیر؛ ٣) چەرمێ کە بۆ کاڵە دەبڕدرێ؛ ٤) ڕوپەڕی کتێب؛ ٥) نیو تەبەقە کاغەز [ف] ١) تك، فاصله‌دار؛ ٢) کناره‌گیر؛ ٣) برش چرم چارق؛ ٤) صفحهٔ کتاب؛ ٥) یك ورق کاغذ.

**لاپەڕوەرگێڕان:** ١) ڕوپەڕهەڵدانەوە؛ ٢) برێتی لە گۆڕینی باس‌و خواس لەسەر مەبەستێ [ف] ١) ورق زدن کتاب و دفتر؛ ٢) کنایه از عوض کردن بحث.

**لاپەڕە:** ١) ڕوپەڕی کتێب‌و نوسراو؛ ٢) نیوتەبەقی کاغەز [ف] ١) صفحهٔ کتاب؛ ٢) نیم ورق کاغذ.

**لاپەڕەوەرگێڕان:** لاپەڕوەرگێڕان [ف] نگا: لاپەڕوەرگێڕان.

**لاپەڕهەڵدانەوە:** لاپەڕوەرگێڕان [ف] نگا: لاپەڕوەرگێڕان.

**لاپەڕهەڵگێڕانەوە:** لاپەڕوەرگێڕان [ف] نگا: لاپەڕوەرگێڕان.

**لاپەل:** لاپەڕ [ف] نگا: لاپەڕ.

**لاپەلە:** لاپەڕە [ف] نگا: لاپەڕە.

**لاپێ:** کوێرەڕای سەخت [ف] کوره‌راه دشوار.

**لاپیتە:** لابیتە [ف] نگا: لابیتە.

**لاپێژ:** تەپاڵەپێژی بە هەق یان بە نیوەیی [ف] تاپاله پهن کن مزدور.

**لات:** ١) نەدارو فەقیر؛ ٢) حاڵ پەرێشان؛ ٣) بەردی پانو لوس، تات؛ ٤) لە کن تۆ؛ ٥) زەوی خەت‌دراو بۆ کێڵان؛ ٦) شاخ، بەردی گەورە لە چیادا؛ ٧) شەڕفرۆش [ف] ١) فقیر؛ ٢) پریشان‌حال؛ ٣) تخته‌سنگ صاف؛ ٤) نزد تو؛ ٥) زمین شیار شده برای شخم زدن؛ ٦) صخرهٔ کوه؛ ٧) لات.

**ڵات:** ١) تاتەبەرد؛ ٢) شاخ، بەردی زلو بڵند لە کێودا [ف] ١) تخته‌سنگ؛ ٢) صخرهٔ عظیم در کوه.

**لاتار:** ١) تاوێرەبەرد، بەردێ کە لە کێو گلار دەبێتەوە؛ ٢) دو داری درێژی لە قیسپ ئەستورتر لە قیسپەعەڕابە قایم دەکرێ [ف] ١) سنگ غلتان از کوه؛ ٢) دوچوب بلند کە در گاری به‌کار می‌روند.

**لاتان:** ١) لجەم قە؛ ٢) کۆمای بێ‌ئاکاران [ف] ١) نزد شما؛ ٢) لاتها.

**لاتانە:** ١) کاری بێ‌ئاکارانە؛ ٢) لە کن ئێوەیە [ف] ١) کار هرزه؛ ٢) نزد شما است.

**لاتاو:** زیپك، قسەی بەتێکوڵ، لابڕدنگ [ف] متلك.

**لاتایەن:** ژنێ کە کۆمەکی تایەن دەکا لە کاری مامانیدا [ف] دستیار ماما.

**لات‌بوون:** ١) پەرێشان‌حاڵ‌بوون؛ ٢) فەقیر بوون [ف] ١) پریشان احوال شدن؛ ٢) فقیرشدن.

**لاتخانە:** تەمەڵ‌خانە، فەقیرخانە [ف] نوانخانه.

**لاتر:** ئامرازێکی قومارە دەی سووڕێنن خۆت‌و بەختت [ف] لاتاری.

**لاتـراسکه:** ۱) تل‌خواردن؛ ۲) لادانی بارەبەر لە ڕێگە بۆ لەوەڕ ف ۱) تلوخوردن؛ ۲) راه کج کردن باربر برای علف.

**لاتڕقەوچ:** ۱) تیلاوتیل؛ ۲) خوارو خێچ ف ۱) اُریب؛ ۲) کج و کوله.

**لاتڕقەوچە:** لاتڕقەوچ ف نگا: لاتڕقەوچ.

**لاتڕقەوچەپێچ:** لاتڕقەوچ ف نگا: لاتڕقەوچ.

**لاتڕقەوچەلّفاچ:** لاتڕقەوچ ف نگا: لاتڕقەوچ.

**لاتروسکه:** لاتراسکه ف نگا: لاتراسکه.

**لاتره:** ڕەت، تل ف تلو.

**لاتره‌بردن:** ڕەت‌بردن، بەولاولادا کەوتن ف تلوخوردن.

**لاتره‌بەستن:** ڕەت‌بردن‌و لەدوور کەوتن ف تلوخوردن و به دور افتادن.

**لاتریسکه:** لاتراسکه ف نگا: لاتراسکه.

**لات‌فرۆشی:** شەڕفرۆشی ف شارلاتانی.

**لاتك:** پارچەزەوی پچوك ف قطعه‌زمین کوچك.

**لات کەوتن:** تەواو دامان‌و بێ‌حاڵ‌بوون ف بینوا و در ماندن.

**لاتولوت:** ڕەجاڵەو ڕوتەو پوتە، عەلۆجەلۆ ف اوباش، رجّاله.

**لاتولەوا:** لاتولوت ف اوباش.

**لاتـه:** ۱) تەنگەنەفەسی؛ ۲) جۆرێ جبە؛ ۳) نك تەیە؛ ۴) کابرا ڕوت‌و نەدارە ف ۱) نفس تنگی؛ ۲) نوعی بالاپوش؛ ۳) نزد تو است؛ ۴) بینواست.

**لاتەبەق:** پەڕەکاغەز ف نیم ورق کاغذ.

**لاتـەڕاد:** چەرم‌و گۆشتی نێوان ڕان‌و زگ لە تەنیشتەوە، تەڕاد ف تهیگاه میان ران و شکم.

**لاتەڕاف:** گۆشتی خاڵیگە ف گوشت تهیگاه.

**لاتەری:** ۱) لاتار، تاوێر؛ ۲) گۆترە ف ۱) نگا: لاتار؛ ۲) الکی.

**لاتەڕیزە:** لاتەڕاد ف نگا: لاتەڕاد.

**لاتەریك:** دوورەپەرێز ف بی‌طرف، کناره‌گیر.

**لاتەك:** لە ئالی، لە پەنا ف طرف پهلو.

**لاتەنشت:** لاتەك ف طرف پهلو.

**لاتەنیشت:** لاتەك ف طرف پهلو.

**لاتەوەق:** لاتەبەق، پەڕەکاغەز ف نیم ورق کاغذ.

**لاتی:** ۱) شپرزەیی؛ ۲) شەڕفرۆشی ف ۱) بینوایی؛ ۲) شارلاتانی.

**لاتێ:** کڵاوی پەستواو لە خوری ف کلاه پشمی.

**لاتیر:** تماشا بە گۆشەی چاو: (**لاتیر** تواشای کردم) ف نگاه با گوشهٔ چشم.

**لاتێڕ:** بەشێ لە دو بەشی جەواڵی دوتایی ف لنگهٔ جوال دوتایی.

**لاتیگەری:** بەرهەڵدایی‌و شەڕفرۆشی ف بی‌بندوباری و شارلاتانی.

**لاتیل:** ۱) لاتیر؛ ۲) بڕینی قیچەلّفاچ؛ ۳) گەنم بەدەم‌بادادان بە لێواری بێژنگ ف ۱) نگا: لاتیر؛ ۲) برش اُریب؛ ۳) غلّه به‌باد دادن با لبهٔ غربال.

**لاتیلاگ:** گۆشەی کەللەی سەر: (کڵاوی بە **لاتیلاگی** سەریەوە نابو) ف طرفی از کلّه سر.

**لاتیه:** لاتێ ف کلاه پشمی.

**لاج:** ۱) کوڕەجحێڵەی شۆخ‌و جوان؛ ۲) تەنیشت‌و لا. بۆ هێلکەی ئێژن ف ۱) جوان زیباروی؛ ۲) کنار. *برای تخم‌مرغ گویند.*

**لاجامه:** ۱) داری کەنارەی عارەبە؛ ۲) دیوارۆکەی بەرهەیوان؛ ۳) تیغەی نێوان ژوور لە دار؛ ۴) وێنەی لە تەنشتەوە؛ ۵) داری ئەولاولای لاشیپانە ف ۱) نردهٔ پهلوی گاری کشاورزی؛ ۲) نردهٔ تراس؛ ۳) تیغهٔ چوبین بین دو اتاق؛ ۴) عکس نیمرخ؛ ۵) دوچوب عمودی چهارچوب در.

**لاجان:** ناوچەیەکە لە کوردستان ف ناحیه‌ای در کردستان.

**لاجانگ:** نێوان ڕوومەت‌و ئەستۆ ف عارض، عُذار.

**لاجك:** لاوك، جحێڵ ف نوجوان.

**لاجڵەو:** ئەسپی تەعلیم‌نەدیتوی سەرڕەق ف بدلگام.

**لاجوەرد:** بەردێکی بەقیمەت‌و زۆر سەختە ڕەنگی عاسمانی‌یە. دەکرێتە *قاشی ئەنگوستیلە یان دەیکەنە تۆزو لە ڕەسم‌کێشی‌دا بەکار دێنرێ* ف لاجورد.

**لاجوەردی:** بەڕەنگی لاجوەرد ف لاجوردی.

**لاجه:** پەنابەر ف پناهنده.

**لاجەك:** لاجك، جحێڵ ف نوجوان.

**لاجیوەرد:** لاجوەرد ف لاجورد.

**لاجیوەردی:** لاجوەردی ف لاجوردی.

**لاچار:** داڵگۆشت ف کز.

**لاچاو:** گۆشەی چاو، تیلی چاو ف گوشهٔ چشم.

**لاچاوه:** دو باریکەقایشی بەندکەری سەرکەللەو ڕەشمە ف دوقطعهٔ چرمی از ابزار دهنه و افسار اسپ که در طرفین صورت قرار دارند.

**لاچـك:** ۱) بەژنی گیا، ساقـەتـە، لاسـك؛ ۲) لەتکـەهـەرمێ؛ ۳) سوکەڵەسەرپۆشی ژنانە ف ۱) ساقهٔ گیاه؛ ۲) برگهٔ گلابی؛ ۳) لَچك.

**لاچلاچ:** شەویلکە، شەویلە، کاکیلە ف آرواره.

**لاچلاچك:** لاچلاچ ف آرواره.

**لاچن:** دوورکەونەوە ف ۱) کنار بروند، برداشته شوند؛ ۲) کنار بروید.

**لاچناکه:** بەشی سەروی شەویلە ف قسمت بالایی آرواره.

**لاچناگه:** لاچناکه ف نگا: لاچناکه.

**لاچو:** ۱) لاچۆ؛ ۲) لە نزیکەوە نەما؛ ۳) لە بەین چو ف ۱) برو کنار؛ ۲) دورشد؛ ۳) محو شد.

**لاچۆ:** کەنار بڕۆ، دوور کەوە ف بروکنار.

**لاچۆپاچۆ:** خرت‌و پرت، شڕەو بڕە ف خرت وپرت.

**لاچـوون:** ۱) دوورکـەوتنەوە لە جێگەی خۆ؛ ۲) ڕابردوی چوون بۆ کۆ، لە جێگەی خۆ نەمان ف ۱) کنار رفتن؛ ۲) کنار رفتند.

**لاچەژ:** موڕەبا، میوەی لە شەکردا کوڵێندراوی هەڵگیراو ف مُربّا.

**لاچەنه:** ۱) لاچناگە؛ ۲) قایشی سەرکەللەی لغاو کە بە سەر شەویلەدا دەچێ ف ۱) نگا: لاچناگه؛ ۲) نوار چرمی لگام که برآرواره می گذرد.

**لاچین:** ۱) مەڵبـەنـدێکە لە کوردستان؛ ۲) ناوی گوندێکە؛ ۳) کاڵەی چەرمین؛ ۴) سەقـر، باڵـدارێکی ڕاوکـەرەو لە باز پچـووکتـرە ف ۱) ناحیه‌ای در کردستـان؛ ۲) نام دهی است؛ ۳) پاتـابه، چارق؛ ۴) از پرندگان شکاری است، چغر.

**لاحیده:** عەلاحیده، تایبەتی [ف] ویژه.

**لاخ:** گیای بەدەس‌دوراوی کۆوەنـەکـراوی نەبەستراو [ف] گیاه دروشدهٔ دسته نشده.

**لاخا:** لابا، دوُرخاتەوە [ف] به کنار بزند.

**لاخاڵی:** تەنیشت‌والا [ف] پهلوتهی.

**لاخاڵیگە:** لاتەڕار، لاتەڕیزە [ف] تُهیگاه.

**لاخستن:** ۱) دانــەکــەنــارەوە؛ ۲) لەسـەر تەنیشت درێژکـردن؛ ۳) کەم‌فرۆشی‌و تەرازوسوُکی [ف] ۱) کنار زدن؛ ۲) بر پهلو دراز کردن؛ ۳) کم‌فروشی.

**لاخ کرن:** ۱) درونـەوەی گیاو دەخڵ؛ ۲) خاوێن‌کردنەوەی چەکی شەڕ؛ ۳) بەسەریەکداکردنی دەغڵ‌و گیای دوراو [ف] ۱) بسته‌بندی دروشده؛ ۲) پاك کردن اسلحه؛ ۳) برهم انباشتن بسته‌های درو شده.

**لاخوار:** ۱) باری چەفتەوبوُگ؛ ۲) ژێرو [ف] ۱) بار کج؛ ۲) طرف پایین.

**لاخوارگ:** ژێرو [ف] طرف پایین.

**لاخوارو:** لاخوارگ، ژێرو [ف] طرف پایین.

**لاخـوڕ:** ۱) حەیوانێ کە لە ئاخوڕی حەیوانی تەنیشتی دزی دەکا؛ ۲) بریتی لە چەورەو ماڵانگەڕ [ف] ۱) دامی که از آخور پهلویی بچرد؛ ۲) کنایه از سورچران.

**لاخوراو:** کەنارەسواو [ف] پهلوساییده.

**لاخە:** گیای دروواوی نەبەستراوی کۆم‌نەکراو [ف] گیاه درویدهٔ جمع نشده.

**لاخێز:** ۱) سێڵاو؛ ۲) ئاخێز [ف] ۱) سیل؛ ۲) نیم‌خیز.

**لادار:** ۱) ئاڵـوداری خانـو؛ ۲) چەڵاکی قەراغ ڕەشمـاڵ؛ ۳) دوداری درێژی چوارچێوەی دارتــەون؛ ۴) تەرفـدار [ف] ۱) الـوار سقف؛ ۲) ستونك کنارهٔ چادر؛ ۳) چوب کنارهٔ دستگاه بافندگی؛ ۴) طرفدار.

**لادان:** ۱) خستنـەکـەنـارەوە؛ ۲) تاقـەی گوشاد؛ ۳) بریتی لە دیەنی‌و میوان‌بوُن: (فـەرمون **لادەن**، لای ئەوان **لامان دا**)؛ ۴) کلابوُن: (لە ڕێ **لای دا**) [ف] ۱) کنارزدن؛ ۲) تاقچهٔ گشاد؛ ۳) کنایه از مهمان شدن و اقامت کردن؛ ۴) انحراف.

**لادایەن:** لاتایەن [ف] کمك ماما.

**لادڕ:** بوُدڕ، ڕەهوڵ [ف] شکاف در سنگ و کوه.

**لادڕگە:** لادڕ، بوُدڕ [ف] نگا: لادڕ.

**لادز:** ۱) دەسکیس؛ ۲) دزی خوێرێلەو سیرمەخوڕ [ف] ۱) همکار دزد و به ظاهر آشنا؛ ۲) دله‌دزد.

**لادە:** ۱) تەپاڵەی لەسەریەك داندراوی قوُچەوەکراو، دیوار لە تەپاڵە؛ ۲) میوان بە؛ ۳) لە ڕێ کەنار بگرە [ف] ۱) دیواره از تاپاله؛ ۲) مهمان باش؛ ۳) کناربگیر.

**لادەر:** لە ڕێ دەرچوُگ [ف] مُنحرف.

**لادەس:** نزیك ئەوەندەی دەست بیگاتێ [ف] نزدیك در دسترس.

**لادەست:** لادەست [ف] دردسترس.

**لادەستی:** جۆرێ کولێرە، پەنجەکێش [ف] نوعی گردهٔ نان.

**لادەگا:** ۱) دێ، دێهات؛ ۲) جێگەی ئیسراحەت [ف] ۱) روستا؛ ۲) جای استراحت، استراحتگاه.

**لادێ:** ۱) دێهات؛ ۲) ساتێ، تاوێ [ف] ۱) روستا؛ ۲) دمی.

**لادیڤ:** دەشتەکی، بەرانبەری شارستانی [ف] روستایی.

**لادێیی:** خەڵکی دێهات، گوندی [ف] روستایی.

**لار:** ۱) خوار، چەوت، چەوێڵ؛ ۲) بەدەن، گش ئەنــدام؛ ۳) جۆرێ تفەنگی ڕاو؛ ۴) ڕۆیشتنی بەناز: (لەنجەو لار)؛ ۵) کز، داڵگۆشت؛ ۶) پشتێر؛ ۷) جۆبڕکە، مڵە [ف] ۱) کج؛ ۲) تن؛ ۳) نوعی تفنگ شکاری؛ ۴) چم و خم، رفتن با ناز و عشـوه؛ ۵) لاغـر؛ ۶) طویلهٔ گاوان؛ ۷) حشرهٔ آبدزدك.

**لاڕ:** کز، داڵگۆشت [ف] لاغر.

**لاڕان:** بەشی ئەستوُرایی ڕان [ف] قسمت کُلُفت ران.

**لاربوُن:** ۱) خواربوُن؛ ۲) داهاتن [ف] ۱) کج شدن؛ ۲) خمیدن.

**لاڕبوُن:** کزبوُن، گۆشت‌کەم‌کردنی بەدەن [ف] لاغر شدن.

**لاربـوُنـەوە:** ۱) داهـاتن، چەمانەوە؛ ۲) بریتی لە گیان‌دەرچوُن [ف] ۱) خمیدن؛ ۲) کنایه از مُردن.

**لارك:** تەنشت، تەك [ف] پهلو، کنار.

**لارکـردن:** ۱) چەماندن؛ ۲) خوارکردن: (خۆت جوانی دروس دەکەی دەڵێی مەی‌بینە/ پیاڵێکی پڕاوە **لاری کەو** مەی ڕێژە) «خیّام» [ف] ۱) خم نمودن؛ ۲) کج کردن.

**لارکردنەوە:** لارکردن [ف] نگا: لارکردن.

**لاڕکە:** ڕکە، سەرەوژوُرەی سەخت‌و دژوار [ف] سر بالایی صعب‌العبور.

**لاڕوُ:** دیمەنی ڕوخسار لە تەنیشتەوە [ف] نیمرخ.

**لاروا:** ۱) ڕۆیشتنی خوارەوخوار، لابەلاڕۆیشتن؛ ۲) کۆمەڵی کڕیاران [ف] ۱) تلوخوردن از بی‌تابی؛ ۲) گروه خریداران.

**لاروالاروا:** خوارەوخوار ڕۆیشتن، تلاوتل [ف] تلوتلوخوردن.

**لارِوایی:** کڕینی شتێ لە لایەن چەند کەسێکەوە [ف] خرید مشترك.

**لارولەنجە:** ڕۆیشتنی بەناز [ف] خرام.

**لارە:** ۱) تونــدگریانی زاروُ؛ ۲) ئامـوُری یەکپـارچـە کە دەنـدەش لە خۆیەتی؛ ۳) دەنکێکــە لە ناو گەنم دەڕوێ؛ ۴) ڕۆیشتنی بەنـاز؛ ۵) بزوتنـەوەی گیاو لکەداری ناسك لەبەر با؛ ۶) جانەوەرێکی بچوکە لە ئاودا؛ ۷) جۆرێ گەنم؛ ۸) خوارەوبوُن بە لای تەنشتا؛ ۹) خەتی خوار لەکێڵانـدا، هێڵی چەفت [ف] ۱) گریهٔ شدیدبچه؛ ۲) خیش یکپارچه؛ ۳) دانه‌ای انگل در گندمزار؛ ۴) خرام؛ ۵) جنبش شاخه و گیاه از باد؛ ۶) حشره‌ایست آبزی؛ ۷) نوعی گندم؛ ۸) خم شدن به طرف پهلو؛ ۹) خط کج و مُعْوَج در شُخم.

**لارەسا:** سێبەری نیوەڕۆژە [ف] سایهٔ زوالی.

**لارەسەنگ:** تاسەنگ [ف] بار کج.

**لارەسیبەر:** لارەسا [ف] سایهٔ زوالی.

**لاڕەشە:** نەخۆشیەکی ئاژەڵە [ف] نوعی بیماری دام.

**لارەلار:** لابەلاڕۆیشتن [ف] جنبیدن به هردو طرف در راه رفتن.

**لارەلارە:** لارەلار [ف] نگا: لارەلار.

**لارەمل:** گەردن‌کەچ [ف] گردن کج.

**لارەوای:** لاروایی [ف] خرید مشترك.

**لارەوبوُن:** لاربوُنەوە [ف] نگا: لاربوُنەوە.

**لارەوکردن:** لارکردنەوە [ف] نگا: لارکردنەوە.

**لارەوەبوُن:** لاربوُنەوە [ف] نگا: لاربوُنەوە.

**لارەوەکردن:** لارکردنەوە [ف] نگا: لارکردنەوە.

**لارەوەلارەوە:** لارەلار [ف] نگا: لارەلار.

**لاری:** ١) خواری، جەوتی؛ ٢) سەرنـاوی جوٚرێ کەرگی ئەستـوٚ ڕوٚتی بالاّبەرزە؛ ٣) بازی، گاڵتە، گەمە؛ ۴) دوژمنایەتی؛ ۵) بەقسەنەکردن: (چیت پێ دەڵێ **لاری** مەکە) [ف] ١) کجی؛ ٢) لقب نوعی مُرغ، مُرغ لاری؛ ٣) بازی؛ ۴) دشمنی؛ ۵) گوش به حرف ندادن.

**لاڕی:** کزی، لاوازی، داڵگوٚشتی [ف] لاغری.

**لاڕێ:** ١) لادەر لە ڕێگە؛ ٢) پێچەقێن و نەساز [ف] ١) منحرف؛ ٢) لجباز.

**لاڕێبوُن:** ١) لەڕێ لادان؛ ٢) بڕێتی لە بایی بوُن [ف] ١) منحرف شدن از راه؛ ٢) کنایه از متکبّر شدن.

**لاری کردن:** ١) لە فەرمان دەرچوُن؛ ٢) گاڵتەکردن [ف] ١) تمرّد کردن؛ ٢) شوخی و بازی کردن.

**لاڕێ کردن:** فریودان و لە ڕێ دەربردن [ف] فریب دادن و منحرف کردن.

**لاڕێ گرتن:** لاڕێبوُن [ف] منحرف شدن.

**لاز:** ١) لاج؛ ٢) شیاکە؛ ٣) بەرانی چوارساڵە [ف] ١) بُرنای شوخ و زیبا؛ ٢) سرگین؛ ٣) قوچ چهارساله.

**لازگرد:** جوٚرێ کوتاڵی گەزە [ف] نوعی پارچه.

**لازم:** پێویست [ف] لازم.

**لازوٚ:** ١) ناوە بوٚ پیاوان؛ ٢) ئەی جوان!، ئەی جحێڵ! [ف] ١) نام مردانه؛ ٢) خطاب به بُرنا، ای جوان!.

**لازوُیت:** ١) گەنمەشامی، گوڵەپێغەمبەرە؛ ٢) لاسکی گەنمەشامی [ف] ١) بَلال، ذرّت؛ ٢) ساقهٔ ذرّت.

**لازە:** بێ کەس و بێ سەرپەرشت [ف] بی فامیل و سرپرست.

**لازیان:** گونـدێکی کوردستـانە بەعسی کاولی کرد [ف] نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**لاژ:** ١) گێژ، نەفام، کەمئاوەز، تێ نەگەیشتو؛ ٢) چەقەسروٚی قسەبێتام [ف] ١) اَبله، کم فهم؛ ٢) ژاژخا.

**لاژك:** لاژ [ف] نگا: لاژ.

**لاژگ:** لاژ [ف] نگا: لاژ.

**لاژلاژ:** لوٚژلوٚژ، ڕویشتنی بەتەمەڵی [ف] نگا: لوٚژلوٚژ.

**لاژە:** گوٚرانی [ف] ترانه.

**لاژەبێژ:** گوٚرانی بێژ، قامبێژ [ف] ترانه‌خوان، خواننده.

**لاژەك:** لاجەك [ف] نوجوان.

**لاس:** ١) لاز، لاج، جحێڵی جوان چاك؛ ٢) لاخە؛ ٣) دارێکە لە دارسنجو دەکـاو دڕکی نیە؛ ۴) کوٚمـای گزرە؛ ۵) دەنگی گوٚڵـەسەگ لە کاتی تاوکـردنی دێڵەبـەبـادا؛ ۶) ژەنینی گوٚڵەسەگ لە دێڵەبەبا؛ ٧) فریو، فریب؛ ٨) ڕیخ، شیاکە؛ ٩) ناوی پیاوانە [ف] ١) برنای زیبا؛ ٢) نگا: لاخـــه؛ ٣) درختی است جنگلی شبیه درخت سنجـد؛ ۴) تودهٔ گیاه کوبیده؛ ۵) صدای سگ نر هنگام جفتگیری؛ ۶) کله‌زدن سگ نر بر ماده؛ ٧) فریب؛ ٨) سرگین؛ ٩) نام مردانه.

**لاسا:** دەمەلاسکە [ف] تقلید، ادا درآوردن.

**لاسار:** ١) گوێ نەبیس؛ ٢) سەرسەخت [ف] ١) حرف نشنو، لجباز؛ ٢) دیکتاتور.

**لاسـاری:** ١) گوێ نەبیسی؛ ٢) پێچەقێنی، سەرسەختی [ف] ١) حرف نشنوی؛ ٢) دیکتاتوری.

**لاساکردنەوە:** دەمەلاسکەکردن [ف] ادای کسی را در آوردن.

**لاسامە:** ١) شەست، ڕێژنە، ڕەهێڵە؛ ٢) سێڵاو، لاپاو، لاخێز [ف] ١) رگبار باران؛ ٢) سیل.

**لاسایی:** دەمەلاسکە، لاسا [ف] نگا: لاسا.

**لاسایی کردنەوە:** لاساکردنەوە [ف] ادای کسی را درآوردن.

**لاستیق:** جیل. جیر [ف] لاستیك.

**لاستیك:** جیر، لاستیق [ف] لاستیك.

**لاس‌خواردن:** خەڵەتان، فریوخواردن [ف] فریب خوردن.

**لاسدان:** ١) خاپاندن؛ ٢) ژەنینی گوٚڵ لە دێڵەبەبا [ف] ١) فریب دادن؛ ٢) کله‌زدن سگ نر ماده را.

**لاسـك:** ١) حیلەی سەبـری ئەسپ؛ ٢) لاچـك؛ ٣) ڕیخ، شیاکە؛ ۴) قروُسکەی گوٚڵەسەگ لە تاوکردنی دێڵ‌دا؛ ۵) زگ بە لای خاڵیگەوە؛ ۶) زمـان‌کێشـان لە گەرمان [ف] ١) شیههٔ آهستهٔ اسب؛ ٢) ساقه؛ ٣) سرگین؛ ۴) صدای نازك سگ نر در لاس زدن با ماده؛ ۵) جانـــبِ شکم؛ ۶) زبان در آوردن و هن هن کردن از گرما.

**لاس کردن:** ١) درونی گیاو نەبەستنی؛ ٢) حیلاندنی بەسەبری ئەسپ؛ ٣) شیاکـەکـردنی ڕەشەولاّغ [ف] ١) درویدن و جمع نکردن گیاه؛ ٢) شیهه کشیدن آهستهٔ اسب؛ ٣) سرگین انداختن گاو.

**لاسکەلاسك:** ١) لاسی گوٚڵەسەگ؛ ٢) حیلەی لەسەرخوٚی ئەسپ؛ ٣) زمان‌کێشان و پشوسواربوُن لە گەرمان [ف] ١) لاس سگ نر؛ ٢) شیههٔ آهستهٔ اسب؛ ٣) زبان در آوردن و به هن‌هن افتادن از گرما.

**لاسکێ:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد [ف] روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**لاسماڵ:** کەسێ تەپاڵە لە دەشت کوٚدەکاتەوە [ف] کسی که تاپاله جمع می کند.

**لاسماڵی:** کوٚکردنەوەی تەپاڵە لە دەشت [ف] تاپاله جمع کردن.

**لاسوٚ:** ١) ناوی پیاوانە؛ ٢) لازوٚ، ئەی جوان! [ف] ١) نام مردانه؛ ٢) ای جوان!.

**لاسـوُتاو:** ١) زوٚر برژاوی کەمێك لێ‌سوُتاو: (چەوەندەری **لاسوُتاو** زوٚر خوٚشە)؛ ٢) میوەی بێستانی زەدەدار [ف] ١) نیم‌سوخته؛ ٢) میوهٔ زده‌دار پالیزی.

**لاسوٚتی:** لاسوُتاو [ف] نگا: لاسوُتاو.

**لاسوڕ:** ١) خلیسکان؛ ٢) خلیسك [ف] ١) لغزش؛ ٢) لیزگاه.

**لاسوٚر:** شتێ کە هێندێکی سوُر بێ: (سێوی **لاسوٚر**، مەلای **لاسوٚر**) [ف] نیمه‌سرخ.

**لاسوُر:** ١) لاسوّر؛ ٢) گونديّكه له كوردستان بەعسی ویّرانی كرد ف ١) نگا: لاسوُر، نیمەسرخ؛ ٢) از روستاهای ویران شدۀ كردستان توسط بعثیان.

**لاسوُره:** لاسوُر: (كولّمت سێوی **لاسوُره**) ف نیمەسرخ.

**لاسەروُ:** ١) سەرەوەی كوّڕ؛ ٢) بڵندایی ف ١) صدر مجلس؛ ٢) بلندی.

**لاسەره:** خشڵێكی ژنانه به لایەكی سەریانەوەی قایم دەكەن ف زیوری است.

**لاسەنگ:** ١) تاسەنگ، باری خوار؛ ٢) تەرازوی تاسەنگ ف ١) باركج؛ ٢) ترازوی نامیزان، كفەای سنگین و كفەای سبك.

**لاسی:** ڕیخاوی ف سرگین آلود.

**لاسیق:** لاستیك، جیر ف لاستیك.

**لاسیك:** لاسیق ف لاستیك.

**لاش:** كەلاك، جەندەك، تەرم ف لاشه، جُثّه.

**لاشاخ:** ١) شانێ كێو؛ ٢) ئانیشك ف ١) ستیغ؛ ٢) آرنج.

**لاشان:** ١) جەمسەری قوّڵ و شان؛ ٢) شانی كێو، لاشاخ ف ١) اطراف كتف؛ ٢) ستیغ.

**لاشخوّر:** ١) هەر جانەوەرێ حەیوانی توّپیو بخوا؛ ٢) برێتی له پارەداری پیسكەی پاره بەسوُت دەر ف ١) لاشخور؛ ٢) كنایه از خسیس رباخوار.

**لاشكاو:** شتێ كه له قەراغەوه شكابێ ف كنار شكسته.

**لاشه:** كەلاكی توّپیو، كەلاكی فڕێدراو ف لاشه.

**لاشەڕ:** دوُرەپەرێز له شەڕو كێشه ف ملایم و دور از جار و جنجال.

**لاشەویلاكه:** كەناری كاكیله ف كنارۀ آرواره.

**لاشەویلكه:** لاشەویلاكه ف كنارۀ آرواره.

**لاشەویله:** لاشەویلاكه ف كنارۀ آرواره.

**لاشیپان:** هەریەك له دارەدرێژەكانی چوارچێوەی درگا ف دو ضلع بلند چهارچوب در.

**لاشیپانه:** لاشیپان ف نگا: لاشیپان.

**لاعب كەره:** مەرایی كەر، زمان لوُس ف چاپلوس.

**لاعبی:** لاعب كەره ف چاپلوس.

**لاعیده:** عەلاحیده، تایبەتی ف ویژه.

**لاف:** ١) بەخوّدادەری به پەموّ ئاخندراو؛ ٢) خوّهەڵكێشان؛ ٣) دروّ ف ١) لحاف؛ ٢) لاف؛ ٣) دروغ.

**لافاو:** لاپاو، لاخێز، سێلاّو ف سیلاب.

**لافلافوّك:** لاولاو، لەولاو ف لبلاب.

**لاف لێدان:** خوّهەڵكێشان، پەسنی خوّدان ف لاف زدن.

**لاف وگەزاف:** دروّو دەلەسه ف تُرّهات.

**لافه:** راوه، قسەپەڕێنی، وڕاوه ف هذیان.

**لافی:** دروّزن ف دروغگو.

**لاڤ:** ١) جحێڵ، جوان بەتەمەن، خوّرت، گەنج؛ ٢) خوشیك، جوان لەبەرچاو، قەشەن، زیبا؛ ٣) پاڕانەوه، كرّوُزانەوه ف ١) جوان؛ ٢) زیبا؛ ٣) لابه.

**لاڤاهی:** پاڕانەوه، لاڤایی ف لابه.

**لاڤایی:** پاڕانەوه ف لابه كردن.

**لاڤژ:** لاژه، لاوژه، قام، گوّرانی ف ترانه.

**لاڤلاف:** ١) زوّرجوان و خوشیك؛ ٢) گیایەكه گوڵێكی سوُر یان شین دەكا به دارو گیاوه پێچ دەخوا بەیانیان دەپشكوێ و زوُ دەپوُچێتەوه ف ١) زیبای تمام عیار؛ ٢) لبلاب، پیچك.

**لاڤلاڤك:** گوڵی لاڤلاف ف لبلاب، پیچك.

**لاڤه:** پاڕانەوه ف لابه.

**لاڤه كرن:** لاڤایی ف التماس و لابه كردن.

**لاڤه كی:** بەكروزەوه پاڕانەوه ف التماس و زاری.

**لاڤەلاف:** پاڕانەوەی زوّر ف لابۀ زیاد.

**لاق:** ١) قاچ، له بەری پاوه تا جومگەی ڕان؛ ٢) گوّشتی لاوازی بێ قەڵەوایی ف ١) لنگ؛ ٢) كم گوشت.

**لاق چەقاندن:** پێ چەقاندن، سوُربوُن لەسەر داوای خوّ ف اصرار و لجاجت، پافشاری.

**لاق درێژ:** برێتی له كەڵەگەتی كزو باریك ف لنگ دراز.

**لاقرتی:** گاڵتەو گەپ ف شوخی و تفریح.

**لاقردی:** لاقرتی ف شوخی و تفریح.

**لاقوُن:** ئەستوُرایی سمت ف كلفتی باسن.

**لاقه:** ١) پەیوەندی: (**لاقەم بەسەریەوه نیه**)؛ ٢) گاینی نارەوا: (**لاقەی كردوه**)؛ ٣) پاڕاوەشاندنی بەتەوژم ف ١) علاقه؛ ٢) تجاوز جنسی؛ ٣) لگد.

**لاقەبڕغه:** خاڵیگه، قەبرخه ف تهیگاه.

**لاقەردی:** ١) قسەی زوّروبێ تام؛ ٢) خوّهەڵكیشانی بەدروّ ف ١) سخن بسیار و بی معنی؛ ٢) بلُف زدن.

**لاقەفرته:** پاڕاوەشاندنی تازه كوژراو ف لگدپرانی تازه كشته شده.

**لاقەفرتێ:** لاقەفرته ف نگا: لاقەفرته.

**لاقەفڕێ:** لاقەفرته ف نگا: لاقەفرته.

**لاقه كراو:** گایراو به نارەوا ف مورد تجاوز جنسی واقع شده.

**لاقه كردن:** گاینی نارەوا ف تعرّض جنسی كردن.

**لاقەید:** گەللایی ف بی بند وبار.

**لاقین:** لاقوُن ف كلفتی باسن.

**لاقینگ:** لاقوُن ف كلفتی باسن.

**لاك:** ١) لاشه؛ ٢) كەپەك و جوّی له ئاوداكولاّو بوّ ئاژەڵ و سەگ؛ ٣) بزوتنی دوُر له دەسەڵات: (**لاكی سەریەتی**)؛ ٤) قالب؛ ٥) قەمچان؛ ٦) رەنگه، شایەد ف ١) لاشه؛ ٢) نخاله و جو آب پز برای خوراك دام و سگان؛ ٣) تكان بدون اراده؛ ٤) قالب ریختەگری، لاك؛ ٥) یەقُل دوقُل؛ ٦) شاید.

**لاكان:** پێلاّوێكه له توُڵ دەیتەنن. *پانه له قاچیانی دەبەستن بوّ بەسەربەفرا ڕوّیشتن* ف اسكی محلّی از تركۀ بافته شده.

**لاكانی:** لاكان ف نگا: لاكان.

**لاكاول:** لاقەبرغه، خاڵیگه ف تهیگاه.

**لاکایا:** دەردەدڵ کردن، گلەی لە بەخت کردن ف شکوه کردن.
**لاکایۆخ:** زۆر بەکرۆزەو گلەیی لە ژیان ف شاکی از زندگی.
**لاکایە:** لاکایا ف شکوه کردن.
**لاکاییش:** بەکرۆزەو نۆزە، دەردیدڵ‌هەڵرێژ ف شاکی از زندگی.
**لاکـردن:** سەرو بەرکـردنی تیر بۆ ئامـانـج، لەئـامانج نەکەوتنی تیر ف انحراف تیر از آماج.
**لاکردنەوە:** ئاوڕدانەوە ف واپس نگری.
**لاکم:** ئیتر هەر ئەوەیە، چیترنا ف فقط و فقط.
**لاکن:** لاکم ف فقط و فقط.
**لاکۆ:** زبارەی پەمۆچنین ف پنبه‌چینی تعاونی.
**لاکوت:** ۱) چاوحیز؛ ۲) لاپرەسەن، خۆتێهەڵقوتێن ف ۱) هیز چشم؛ ۲) انگل ناخوانده، فضول.
**لاکۆت:** پەمۆچنی ف پنبه‌چینی.
**لاکۆتی:** پەمۆچن ف پنبه‌چین.
**لاکوتێ:** چلێسی خوازەلۆکی‌خواردن، زگ‌لەوەڕێن ف شکم‌چران.
**لاکۆش:** ۱) خوارەوەی داوێن: (**لاکۆش**ێکی گوێز هێنابو)؛ ۲) بێوەژنی سێوی‌داری بێکەس کە ڕەنج ئەدا ف ۱) دامنهٔ دامن؛ ۲) بیوهٔ بچه‌دار زحمت‌کش.
**لاکۆشکە:** تەرەفداری ف هواخواهی.
**لاکۆشی:** ۱) لاکۆشکە، تەرەفداری؛ ۲) ئەرک‌دانی بێوەژنی سێوی‌دار ف ۱) طرفداری؛ ۲) رنج بیوهٔ بچه‌دار.
**لاکۆڵ:** لە قەراغەوە کۆڵین ف از طرفی کندن.
**لاکۆڵان:** کوچەی تەنگ‌و پەڕ ف پس کوچه.
**لاکە:** لاك، بزوتنی سەربەخۆی لە دەسەڵات بەدەر: (**لاکە**ی سەرم دێت) ف حرکت بی‌اراده.
**لاکەت:** شتێ کە لە قەراغەوە پەڕیبێ ف لب‌شکسته.
**لاکەفتە:** بارکەوتو ف درمانده.
**لاکەل:** ۱) لاکـەت؛ ۲) جۆرێ تفـەنگ ف ۱) لبـه‌شکستـه؛ ۲) نوعی تفنگ.
**لاکەن:** لاکۆڵ ف از یك طرف کندن.
**لاکەند:** لاکۆڵ، لاکەن ف از یك طرف کندن.
**لاکەوتن:** لاچوون ف نگا: لاچوون.
لاکەوتە: بارکەوتو، داماو، لاکەفتە ف درماندە.
**لاکـەی‌سەرهـاتن:** ۱) بریتی لە ماندوبوونی زۆر؛ ۲) بریتی لە کزبوون‌و زراوبوون ف ۱) کنایه از خستگی بسیار؛ ۲) کنایه از لاغر مردنی شدن.
**لاکی:** ڕەنگێکە بۆ قاڵی‌و بەڕە ف رنگی در قالی، لاکی.
**لاکێش:** ۱) قاڵی درێژۆکە، کەنارە؛ ۲) جگەرەخۆر لە توتنی خەڵك؛ ۳) زۆربێژ ف ۱) قالی کناره؛ ۲) سیگاری انگل، مفت‌کش؛ ۳) روده‌دراز، وراج.
**لاکێشی:** ۱) چەنـەبـازی‌و زۆروێژی بێتام؛ ۲) جگەرەکێشی لە توتنی خەڵك ف ۱) وراجی، روده‌درازی؛ ۲) سیگار مفت کشیدن.

**لاکین:** ۱) ئەشکەولەت، بنەدەفری سواڵەتی شکاو؛ ۲) بەڵام، بڵام ف ۱) ظرف سفالین شکسته؛ ۲) لیکن.
**لاگـا:** ۱) جێگەی وچان‌دان لە دەشت؛ ۲) دیهات ف ۱) استراحتگاه صحرایی؛ ۲) روستا.
**لاگایی:** دێهاتی، گوندی ف روستایی.
**لاگر:** تەرەفدار ف هواخواه
**لاگـرتن:** ۱) ئۆقـرەگرتن؛ ۲) تەرەفداری کردن ف ۱) آرام گرفتن؛ ۲) طرفداری کردن.
**لاگری:** تەرەفداری، داژداری ف هواخواهی، طرفداری.
**لاگوێل:** پڕی دەستێ، گوێلێ، گوڵم ف پر یك کف دست.
**لاگە:** لادێ ف روستا.
**لاگەیی:** گوندی، لادێ‌یی ف روستایی.
**لاگیر:** داژدار ف طرفدار.
**لاگیرە:** زەنبەرێکە بە لای سەرەوە قایم دەکرێ ف زیوری است.
**لاگیری:** داژداری ف طرفداری.
**لال:** ۱) بنیادەمێ کە زوانی قسـەکـردنی نەبێ؛ ۲) لجمه، لنك، لەکن: (کیسکا من **لال** تەیە) ف ۱) لال؛ ۲) نزد.
**لاڵ:** ۱) لال؛ ۲) بەردێکـی بەنـرخـە بەڕەنگی سووری توخ‌و سووری ئامـاڵ‌زەرد؛ ۳) سووری تاریك؛ ۴) میوەی زۆرگەیشتو ف ۱) لال؛ ۲) لعل؛ ۳) سرخ تیره؛ ۴) میوهٔ زیادرسیده.
**ڵاڵ:** لال، بێ‌زوان ف لال.
**لالا:** ۱) خەوتنی زارۆك؛ ۲) شەمـعـدانی شوشـەلـەسـەر؛ ۳) لە گشت ئالی‌یەوە: (**لالا** دەورم گیرا) ف ۱) خواب کودك؛ ۲) لاله، شمعدان؛ ۳) از هرطرف.
**لالاف:** لافاو، سێلاو، لەهی، لی، لا، لێمشت ف سیلاب.
**لالاکردن:** خەوتنی زارۆك ف خوابیدن کودك.
**لالاگرتن:** گش ئالی گرتن ف همه طرف را گرفتن.
**لالامۆکردن:** بریتی لە زۆرمەست‌و سەرخۆشی بێ‌هۆش: (هێندە مەستە **لالامۆ** دەکا) ف کنایه از مست خراب.
**لالان:** پاڕانەوە ف لابه.
**لالانەوە:** پاڕانەوە، لالان ف لابه‌کردن.
**لالایی:** ۱) گۆرانی بۆ دەخـەوکـردنی زارۆك؛ ۲) ریایی، کلکـه سووتە، ڕووبنی ف ۱) لالایی؛ ۲) ریا و تملق.
**لالایی:** ۱) بێ‌زوانـی؛ ۲)لـەزوان‌کەوتـن: (**لالایی**م داهـات) ف ۱) بی‌زبانی؛ ۲) از نطق افتادن.
**لالغاوە:** قەراغی دەم، سووچی زار ف گوشهٔ دهان.
**لالکە:** لالان، پاڕانەوە ف لابه.
**لالکەر:** ۱) کەسێ کە دەپاڕێتەوە؛ ۲) ڕووبین ف ۱) لابه‌کننده؛ ۲) متملق.
**لالکـەڕ:** ۱) گاڵتـەی فەنـای بێ‌دەنـگ؛ ۲) کەڕولال ف ۱) نوعی سرگرمی؛ ۲) کر ولال.
**لالکەهاس:** کەسێ کە دەپاڕێتەوە، لالکەر ف لابه‌کننده.
**لالو:** خاڵ، برای دایك ف دایی.

**لالۆ:** لالو، خالۆ ف دایی.

**لالـوپاڵ:** بێ‌دەنگ‌و بێ‌سەروزمان: (لە عەیبەتان **لالوپاڵ** بوٚم) ف بی سروزبان، خاموش.

**لالوت:** قەڵس، کەسێ کە دەنگی لە یەکێك گۆڕیوە: (دەگەڵم **لالوتە**) ف قهرکرده.

**لالوتات:** لاڵ‌وپاڵ ف بی‌سروزبان.

**لالوتە:** گن ف کسی که تو دماغی حرف می‌زند.

**لالوتی:** قەڵسی، قار ف قهرکردگی.

**لالۆچ:** لاگوێل ف بر یك کف دست.

**لالوزا:** خالۆزا ف دایی‌زاده.

**لالۆزا:** لالوزا، خالۆزا ف دایی‌زاده.

**لالوژن:** خالۆژن، ژنی خاڵ ف زن‌دایی.

**لالۆژن:** خالۆژن، لالوژن ف زن‌دایی.

**لالۆمەرە:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**لالویچ:** لالۆچ ف بر یك کف دست.

**لالە:** ۱) خاڵ، لالۆ؛ ۲) شەمدانی بەشوشە، لالا؛ ۳) رەبەنۆك، مێلاقە ف ۱) دایی؛ ۲) مردنگی، شمعدان؛ ۳) آلاله.

**لالە:** پاڕانەوە، لاڤە، لالان ف لابە.

**لالەباس:** گوڵێکی بەرزەبالایـە کە بە زۆرڕەنگـان هەیە ف گـل لاله عبّاسی.

**لالـەبەر:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**لالەپ:** کەنارەی دەستێ ف کنارکف.

**لالەپەترە:** تور، کەسێ کە لە قسەکردندا زمانی گرێ دەکا ف الکن.

**لالەپەتە:** لالەبەترە ف الکن.

**لالەزار:** گوڵجاڕ ف لاله‌زار.

**لالەعەباس:** لالەباس ف گل لاله‌عبّاسی.

**لالەعەباسی:** لالەباس ف گل لاله‌عبّاسی.

**لالەعەبباسی:** لالەباس ف گل لاله عبّاسی.

**لالەعەواس:** لالەباس ف گل لاله عبّاسی.

**لالەغاوە:** لالغاوە ف گوشهٔ دهان.

**لالەك:** لالەپەتە، تور ف الکن.

**لاکەڕ:** گەمەی قڕوقپ ف بازی بی‌صدا.

**لالەکی:** لالی، قسەکردن نەتوانین ف لالی.

**لالەلال:** تورەتور، قسە بە ڕەوانی بۆنەهاتن ف بالکنت سخن گفتن.

**لالەنگ:** تاسەنگ ف نگا: تاسەنگ.

**لالەنگەر:** ئامرازێکی جۆلایی ف ابزاری در دستگاه بافندگی.

**لالەنگی:** میوەیەکە لە تیرەی نارنج‌و پرتەقاڵ نەرم‌و شیرینە ف نارنگی.

**لالەمونی:** لاسای لاڵ کردنەوە ف لال‌بازی.

**لالەوڕ:** زاروی نازیرەك‌و گێلۆکە ف کودك کودن.

**لالـەوەڕ:** ۱) ئاژەڵێ کە لە گەلـە دوور ئەکەوێتەوە؛ ۲) بڕیتی لە چەورەوو زگ‌لەوەڕین؛ ۳) قسەدرێژی کوژجاڕزکەر ف ۱) حیوانی که از گله دور می‌شود؛ ۲) کنایـه از سورچـران؛ ۳) روده‌درازی کـه آدم را خسته می‌کند.

**لالەویچ:** لالۆچ ف پرکف دست.

**لالهی:** پاڕانەوە، لالانەوە ف توسُّل.

**لالەیی:** لالهی ف توسل.

**لالی:** ۱) بێ‌زوانی؛ ۲) لە کن، لە لای؛ ۳) دەوری لە مس؛ ۴) خەوتنی زاروك: (بـەبەکە **لالی** کردوە)؛ ۵) فەرمان بە خەوتنی زاروك: (بەبەکە **لالی**)؛ ۶) خاڵۆ، لالۆ، برای دایك ف ۱) لالی؛ ۲) درنزد؛ ۳) بشقاب مسی؛ ۴) خواب بچه؛ ۵) امر به خوابیدن؛ ۶) دایی.

**لاڵی:** ۱) بێ‌زوانی؛ ۲) سوری بەڕەنگی لاڵ ف ۱) لالی؛ ۲) لعل رنگ.

**لالیان:** پاڕانەوە ف لابە.

**لالیانەوە:** لالانەوە ف لابەکردن.

**لالێ‌بڕین:** قەتیس‌کردن ف در تنگنا قراردادن.

**لالێ‌بڕینەوە:** لالێ‌بڕین ف در تنگنا قراردادن.

**لالێ‌سەندن:** دەرەتان بۆنەهێشتن ف راه فرار بندآوردن.

**لالێ‌سەنن:** لالێ‌سەندن ف راه فرار بندآوردن.

**لالی کردن:** خەوتنی زاروك ف خوابیدن کودك.

**لالێ کردنـــەوە:** ۱) ئاوڕ وەسـەردان؛ ۲) ئاوڕوێدان، پێ‌ڕاگەیشتن؛ ۳) بەشـێکـی گەورە بڕین لە شتێ: (**لایەکی لێ‌کردەوە**) ف ۱) واپس نگاه کردن؛ ۲) غمخواری کردن؛ ۳) قسمتی زیاد از چیزی بریدن.

**لالی‌لالی:** بخەوە بخەوە، دایك بۆ دەخەوکردنی زاروکی دەڵێ ف بخواب بخواب، لالایی برای خوابانیدن کودك.

**لام:** ۱) پەڵپ، بیانو؛ ۲) کوڵمە، گۆنا؛ ۳) لە کن من؛ ۴) بەبڕوای من؛ ۵) ناوی پیتێکی ئەلفوبێتکە؛ ۶) قسەو پرسیار، *دەگەڵ جوم دەگوترێ*: (بێ **لام**و جوم کارەکەی کرد) ف ۱) بهانه، انگیزه؛ ۲) گونه، رخسار؛ ۳) نزدمن؛ ۴) به‌عقیدهٔ من؛ ۵) نام حرفی در الفباء؛ ۶) گفتار.

**لام:** ۱) گوپ؛ ۲) کوڵمە ف ۱) لُپ؛ ۲) گونه.

**لامات:** زللە، زیللە، شەقام ف سیلی.

**لامانە:** جمم مەیە، نك ئیمەیە ف نزد ما است.

**لام‌با:** ۱) دورم‌خاتەوە؛ ۲) لە نزیکم بوایە؛ ۳) لامپا، چرای شوشەبەسەر ف ۱) دورم کند؛ ۲) اگرنزد من بود؛ ۳) چراغ نفتی لامپا.

**لام‌بایە:** نزیکی من با ف اگر نزد من بود.

**لام‌بو:** نزیك بە من بو ف نزد من بود.

**لام‌بوایە:** لام بایە ف اگر نزد من بود.

**لامبە:** لامپا، چرای شوشەبەسەر ف لامپا.

**لام‌بی:** ۱) لام بو؛ ۲) نزیك بە من بی ف ۱) نزد من بود؛ ۲) نزد من باشی.

**لامپا:** چرای بەشوشە ف لامپ، چراغ شیشه‌ای.

**لامپە:** لامپا ف نگا: لامپا.

**لامـژ:** ۱) بێچـوی شیرەخـۆرە کە مەمکی جگـە لە دایکی دەمژێ؛ ۲) کەسێ کەلـەجگـەرەی خەڵکی مژدەدا ف ۱) بچـه‌ای که از پستـان

غیرمادر شیر می‌خورد؛ ٢) کسی که به سیگار دیگران پُك می‌زند.

**لامسەرلایی:** بێ گوێ‌پێ‌دان، گەللایی: (کارەکانی **لامسەرلایی** دەکا) ف اهمیّت ندادن.

**لامشت:** لالۆچ ف پر یك کف دست.

**لامك:** دەمو چاوچکۆڵە ف رخسار کوچولو.

**لامل:** ١) لاقەید؛ ٢) کەنارەی ئەستۆ ف ١) لاقید؛ ٢) صفحهٔ گردن.

**لاملامك:** شەویلاکەی خوارەوە ف آروارهٔ زیرین.

**لامـۆ:** ١) ئاوەکی؛ ٢) حەیوانی بێگـانە لە ناو گەلەدا ف ١) آبکی؛ ٢) حیوان غریبه در گله.

**لاموجوم:** کەمترین قسە لە جوابدا ف کمترین اعتراض، لام تا کام.

**لاموجیم:** لاموجوم ف نگا: لاموجوم.

**لامۆفەك:** یاخی، ئەشقی، دژی زاکۆنی دەوڵەت ف یاغی.

**لامە:** ١) جەم منە؛ ٢) مەرایی، ریایی ف ١) نزد من است؛ ٢) تملّق.

**لامـەردو:** ١) شوێنی میوانـان لە ماڵـدا؛ ٢) جێگـەی میوانانی پیاو لە رەشماڵدا ف ١) بیرونی خانه، مهمانخانه؛ ٢) جای مهمانان در چادر.

**لامەردە:** لامەردو ف نگا: لامەردو.

**لامەرکەزی:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**لامەزەب:** زاڵم، بەدکار ف ستمگر.

**لامەلە:** سۆبایی لەسەر لاتەنیشت ف شنای بر پهلو.

**لامەمك:** دو زارۆ کە شیری دایکێك دەمژن ف هم‌شیر.

**لامی:** ١) رۆڵە، عەولاد؛ ٢) جەم منی ف ١) فرزند؛ ٢) نزد منی.

**لامی جیم:** خۆهەڵکێشان، مەحتی‌خۆکردن ف لاف و خودستایی.

**لامێردان:** لامەردو ف نگا: لامەردو.

**لامێردە:** لامەردو ف نگا: لامەردو.

**لامێژ:** بێچوێ کە شیری جگە لە دایکی خۆی دەمژێ، لامژ ف نگا: لامژ.

**لامیسك:** بێچارەو نەدار ف بینوا.

**لان:** ١) نك ئێمە؛ ٢) نك، جەم، کن؛ ٣) کونی شێرو کەروێشك؛ ٤) گە، مان؛ ٥) نهێنی: (سەگی لانگر واتا: یانی‌گر) ف ١) نزدما؛ ٢) نزد؛ ٣) کنام شیر و لانهٔ خرگوش؛ ٤) اعتصاب، امتناع از رفتن؛ ٥) بدون خبردادن.

**ڵان:** پاشگرێ کە جێگە دەگەیەنێ: (بەردەڵان، کەندەڵان) ف پسوند مکان.

**لانجیر:** دیزەی شیر تێدا هەوێن‌کردن ف دیزی ماست‌بندی.

**لاندر:** بۆدر، رەهۆڵ ف آبکند، کند.

**لاندك:** بێشکە، دەرگوش، دەیدیك ف گهواره.

**لانك:** بێشکە، دەرگوش، دەیدیك، لاندك ف گهواره.

**لانکە:** لاندك، لانك ف گهواره.

**لانکەیی:** کاریتەی میچ بە پانەوە ف الوار سقف از پهنا.

**لانگر:** ١) داژدار، تەرەفدار؛ ٢) سەگێ کە بێ حەپە گاز لە پیاو دەگرێ ف ١) طرفدار؛ ٢) سگی که بدون پارس گاز بگیرد.

**لان گرتن:** تەرەفداری کردن ف طرفداری.

**لانگیری:** لان‌گرتن ف طرفداری.

**لانە:** ١) لامانە؛ ٢) شوێنی شەوانەی باڵدار؛ ٣) کونی شێر؛ ٤) قەد، لا: (بـە دولانـە دەگاتـەوە)؛ ٥) برێتی لە جێ‌سانـەوەی بنیادەم: (خانەو لانـەیەکمـان نیە)؛ ٦) پاشگـری پچـوكشانـدان: (خـڕیلانـە، خونچیلانـە)؛ ٧) کەلەم، کەلەرم، کەلەم ف ١) نزد ما است؛ ٢) آشیانه؛ ٣) کنام شیر؛ ٤) لا؛ ٥) کنایه از خانه؛ ٦) پسوندتصغیر؛ ٦) کلم.

**لانـەواز:** ١) بێ‌کەس‌و نازشـێواو؛ ٢) رەبـەن‌و ئاوارە؛ ٣) باڵـداری لانەگوم‌کردو ف ١) بیچاره و درمانده؛ ٢) آوارهٔ خانه بەدوش؛ ٣) پرندهٔ آشیان گم کرده.

**لانەوبان:** ماڵ‌وحاڵ ف خانەوکاشانه.

**لانەوبانە:** لانەوبان، ماڵ و حاڵ ف خانه و کاشانه.

**لانـەولان:** جێ گۆڕکێ کردنی کەروێشك لە ترسان ف جا عوض کردن خرگوش از ترس.

**لانی:** ١) ئەندازە: (**لانی** کەم وەرە لامان، **لانی** کەم مشتێ گەنم بدە)؛ ٢) لە لای: (بـرام **لانی** مامپیرۆتە)؛ ٣) کونی جانەوەرانی کێوی ف ١) حدّ؛ ٢) درنزد؛ ٣) سوراخ حیوانات کوهی.

**ڵانی:** ڵان: (شینکەو سەوزەڵانی‌یە) ف پسوندمکان.

**لاو:** ١) خۆرت، جحێڵ؛ ٢) خوشیك، جوان، زێبا؛ ٢) کوڕ، فرزەندی نێر: (زارۆکی من دو کیژو دولاون)؛ ٣) لافـاو، لاپاو، لاخێز، سێڵاو ف ١) بُرنا؛ ٢) زیبا؛ ٣) فرزند نرینه؛ ٤) سیل.

**لاواچ:** پەنجەرەی پچوك ف پنجرهٔ کوچك.

**لاواز:** داڵگۆشت، کز ف لاغر.

**لاوازی:** کزی، داڵگۆشتی ف لاغری.

**لاوان:** ١) خۆرتان، گەنجان، جحێڵان؛ ٢) پاڕانەوە ف ١) جوانان؛ ٢) لابه.

**لاوانـدن:** ١) دڵـدانـەوە، ئاگاداری‌کردن لە کەسێ؛ ٢) پاڕانەوە ف ١) نوازش کردن؛ ٢) لابه کردن.

**لاوانـدنەوە:** ١) لاواندن؛ ٢) بەمردوهەڵگوتن ف ١) نگا: لاواندن؛ ٢) مرده را در شیون ستودن، مویه.

**لاواندنەوە:** لاواندنەوە ف نگا: لاواندنەوە.

**لاوانـە:** ١) خۆرت‌ئاسـایی، وەك جحێڵان؛ ٢) قەراغی بڵنـدکراو؛ ٣) قەراغی قەبر؛ ٤) شیپانە، لاشیپانە؛ ٥) دو دەپی درێژ لە جەنجەڕدا ف ١) جوان مانـنـد؛ ٢) کنـارهٔ برامـده؛ ٣) کنـار ولبـهٔ گـور؛ ٤) کنـارهٔ چهارچوب در؛ ٥) دوتخته در چرخ خرمنکوبی.

**لاوانـەوە:** ١) دڵـداری، دڵخـۆش کردن؛ ٢) پێ‌هەڵگوتنی مردو ف ١) نوازش؛ ٢) مویه.

**لاوانی:** خۆرتی، گەنجایەتی، جحێڵی، لەوەندی ف جوانی.

**لاوتە:** لابوت ف نگا: لابوت.

**لاوج:** شوێنێ کە لایەکی ئاوەو سێ‌لای وشکانیە ف خلیج.

**لاوچاك:** کوڕەجحێڵەی خوشکۆك ف بُرنای زیباروی.

**لاور:** جانەوەری کێوی ف حیوانات وحشی.

**لاوران:** گونـدێکی کوردستـانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.
**لاورگە:** زگ‌لەوەڕێن، چەورە ف طفیلی.
**لاوژا:** براگەورە ف برادر بزرگ.
**لاوژۆك:** تازەجوان، دەمڕووت، لاوی تازەپێگەیشتو ف نوجوان.
**لاوژۆکە:** لاوژۆك ف نوجوان.
**لاوژە:** ١) ستران، گۆرانی، قام؛ ٢) لەبەر ئەوە، بۆ ئەمە ف ١) ترانە؛ ٢) از برای آنکه.
**لاوس:** بانی دەم لە ژوورەوە ف سق.
**لاوك:** گۆرانی درێژو قەدیمی ف ترانهٔ کلاسیك.
**لاوکبێژ:** گۆرانی‌بێژ ف ترانه‌خوان، خواننده.
**لاولا:** ١) دیمەن لە کەنارەوە؛ ٢) قیچەڵقاچ ف ١) منظره از نیمرخ؛ ٢) اُریب.
**لاولان:** دوگوندی کوردستان بەم ناوە بەعسی کاولی کردوە ف دو روستا به این اسم در کردستان توسط بعثیان ویران شده است.
**لاولاو:** لاڤلاڤك ف لبلاب، پیچك.
**لاولاوە:** ١) ئامرازی لێك‌قایم‌کردنی درگاو چوارچێوە؛ ٢) داروکێکی بە بزمار لە چوارچێوەدراو بۆ داخستنی درگاو پەنجەرە ف ١) لولای در؛ ٢) چوبکی به جای رزهٔ دربستن.
**لاولووسە:** تاسولووس، خۆخوان‌کردن ف آرایش، بَزَك.
**لاون:** لاوێنەر، ئەو کەسەی دەلاوێنێتەوە ف مدّاح.
**لاونا:** دڵداری‌دان، لاواندن ف نوازش.
**لاونای:** لاواندنەوە ف نوازش.
**لاونیو:** لاولا ف نگا: لاولا.
**لاووٚ:** هۆی‌جحێـڵ!، ئەی‌جـوان!، وشەی‌بانگ‌کردنـی جوان ف ای جوان!.
**لاوە:** ١) دڵدانەوە؛ ٢) پاڕانەوە؛ ٣) دەرەوە؛ ۴) لابە، هەڵگرە؛ ۵) دەست بەردە؛ ۶) ئەی لاو! ئەی خۆرت!؛ ٧) ئەی جوانچاك!، ئەی خوشیك!؛ ٨) خواستن، داواکردن؛ ٩) ئاوڕ ف ١) نوازش؛ ٢) لابه؛ ٣) خارج ازمنطقه؛ ۴) بردار؛ ۵) دست بردار؛ ۶) ای جوان!؛ ٧) ای زیباروی!؛ ٨) خواستن، طلبیدن؛ ٩) توجّه.
**لاوەدان:** ١) خستنـەکەنارەوە، لادان؛ ٢) دانەوەی زەوی ف ١) به‌کنار زدن؛ ٢) کندن زمین.
**لاوەك:** لەو گونـدانەی کوردستانە کەبەعسی کاولیان کرد ف روستایی درکردستان که بعثیان آن را ویران کردند.
**لاوەکردن:** ١) ئاوڕدانەوە؛ ٢) پاڕانەوە ف ١) واپس‌نگری؛ ٢) لابه‌کردن.
**لاوەکەر:** ١) داواکار؛ ٢) وەشوێن دۆزو مەبەست کەفتن ف ١) طلبکار؛ ٢) پیگیری مرام.
**لاوەکی:** خەڵکی دەرەوە، بیانی، بێگانە ف خارجی، اجنبی.
**لاوەلا:** لابەلا ف نگا: لابەلا.
**لاوەلایی:** لابەلایی ف نگا: لابەلایی.
**لاوی:** ١) جحێڵی؛ ٢) جوانچاکی ف ١) جوانی؛ ٢) زیبایی.

**لاویتە:** لابیتە، لاپیتە ف نگا: لابیتە.
**لاویتی:** ڕۆژگاری جحێڵی، تافی جوانی ف عنفوان جوانی.
**لاوێچ:** لالۆچ ف پرکف دست.
**لاوێژە:** ١) گۆرانی، ستران؛ ٢) تازەجوان ف ١) ترانە؛ ٢) نوجوان.
**لاویژە:** تازەجوان ف نوجوان.
**لاوێن:** ١) چڵەبی ناسك بە ڕیشەوە، ئەمامی داربی؛ ٢) دڵداری‌دەر؛ ٣) چەمێکە لە کوردستان دەڕژێتە دەجلەوە؛ ۴) گوندێکە لە کوردستان ف ١) نهـال بید؛ ٢) نوازش دهنده؛ ٣) رودخانه‌ایست در کردستان؛ ۴) نام دهی است.
**لاوێنەر:** لاوین، لاون ف نوازشگر.
**لاوێنی:** تافی جوانی ف دوران جوانی.
**لاهۆرە:** ١) زەبەلاح، زلحۆرت؛ ٢) قاش لە میوەی بێستان؛ ٣) پواز ف ١) لندهور؛ ٢) برش از میوه، قاچ؛ ٣) پغاز جانبی، گاوه.
**لاهێز:** ١) پشتیوانـەی دیوار؛ ٢) بێ‌تاقەت، کەم‌تابشت ف ١) پشتیبانهٔ دیوار؛ ٢) کم‌توان.
**لاهێزە:** پشتیوانە، لاهێز ف پشتیبانهٔ دیوار.
**لاهیە:** عاریە، ئەندامی بەدەڵ. بۆ *ددانی دەسکردو قژەسەری ناعەسڵی* دەیڵێن ف بدلی. درمورد *دندان و موی مصنوعی می‌گویند*.
**لای:** ١) نك ئەو؛ ٢) تۆ سەرسـەختی؛ ٣) وەکـو ف ١) نزد او؛ ٢) تو لجبازی؛ ٣) مانند.
**لایدە:** لاوەکی ف اجنبی، بیگانه.
**لایز:** لۆسە، نوێڵ، ملّغە، باری ف اَهرُم.
**لای‌لای:** لالایی، گۆرانی‌دەخەوکردنی زارۆ ف لالایی.
**لایلایە:** ١) لای لای؛ ٢) لالی کە ف ١) لالایی؛ ٢) بخواب بچه!.
**لایلایی:** لالایی ف لالایی.
**لایەز:** ئاومالك ف آب آورده.
**لایەلایە:** لای‌لای ف لالایی.
**لایەن:** ١) نك، جەم، کن؛ ٢) ئالی، تەرەف ف ١) نزد؛ ٢) سو، طرف.
**لایەنگر:** تەرەفدار، داژدار ف هواخواه.
**لایەنگری:** داژداری ف طرفداری.
**لایەنگیر:** لایەنگر ف طرفدار.
**لایەنگیری:** لایەنگری ف طرفداری.
**لایی:** سەرسەختی، گوێ‌نەبیسی ف حرف‌نشنوی، لجبازی.
**لایی‌لایی:** لای‌لایی ف لالایی.
**لایین:** لایەن ف نگا: لایەن.
**لب:** دانە، دەنك ف دانه.
**لبا:** ١) لجەم، لنك، لەکن، لای؛ ٢) بەرگنی پەستواو، کولاڤ ف ١) نزد؛ ٢) نَمَد.
**لباتە:** لای تۆ ف نزد تو.
**لباد:** بەرگنی پەستواو، کولاڤ ف نمد.
**لبادە:** فەرەنجی ف بالاپوش نمدی.
**لباس:** جلك، شمەکی دەبەرکردن ف لباس.

**لبال:** له لا، لنك ف نزد.

**لبال‌ته:** لای تۆ ف نزد تو.

**لبان:** ته‌پاڵه‌ی پێڕاو ف تاپاله.

**لب‌لب:** ۱) دانه‌دانه، ده‌نك‌ده‌نك؛ ۲) ده‌نكه‌ده‌نكه‌یه‌ك ف ۱) دانه‌دانه؛ ۲) دانه‌دانه‌یی.

**لبۆ:** ۱) بۆچی؟، چما؟؛ ۲) بۆخاتری، له‌به‌ر ف ۱) برای چه؟؛ ۲) به‌خاطر.

**لبۆدی:** كه‌وانی تیر پێهاویشتن ف كمان تیراندازی.

**لبۆلبۆ:** لب‌لب، دانه‌دانه، ده‌نك‌ده‌نك ف دانه‌دانه، یكی‌یكی.

**لبه‌ر:** ۱) بۆخاتری، له‌به‌ر؛ ۲) به‌رانبه‌ر؛ ۳) له‌پێش، به‌رله؛ ۴) ژێر نه‌كرن ف ۱) به‌خاطر، از برای؛ ۲) مقابل؛ ۳) قبل از، پیش از؛ ۴) ازبر، حفظ.

**لبه‌رخستن:** بێچوپێ فڕێدان ف وادار به سقط جنین كردن.

**لبه‌ركرن:** ۱) ده‌به‌ركردن، پۆشینی جلك؛ ۲) بێ نوسینه‌وه له‌بیر بوُن ف ۱) پوشیدن؛ ۲) حفظ كردن، ازبركردن.

**لبه‌ك:** ده‌نكێك، دانه‌یه‌ك ف یكدانه.

**لبێ:** ۱) به‌لێ، به‌لی؛ ۲) ده‌له‌مه، په‌نیری نه‌گوشراو ف ۱) بلی؛ ۲) دلمهٔ شیر، پنیرآبدار.

**لپ:** ۱) په‌لی دار؛ ۲) پڕاوپڕ، تژه ف ۱) شاخه؛ ۲) لبالب، پر.

**لپاش:** ۱) بێ‌بره‌و، نازه‌واج؛ ۲) نازیره‌ك ف ۱) كساد؛ ۲) كودن.

**لپێش:** ۱) پێشره‌و؛ ۲) به‌قه‌درو حورمه‌ت ف ۱) جلوی، پیشرو؛ ۲) محترم.

**لپێ كرن:** ده‌پێ كردن. بۆ ده‌رپێ‌و پێلاووگۆریه ئێژن ف پوشیدن جوراب و كفش.

**لپێل‌بوُن:** شه‌پۆل‌دان ف موج زدن.

**لته:** له لایه‌ن تۆ ف ازتو.

**لته‌ن:** مژینی مه‌مك‌و گوان، میتن ف مُك‌زدن.

**لج:** ناوچه‌یه‌كه لای دیاربه‌كر له كوردستانی ژێرده‌ستی تركان ف ناحیه‌ای در كردستان.

**لچ:** ۱) لێوی خواره‌وه؛ ۲) قه‌راغ، كه‌ناره؛ ۳) شتێ كه ده‌چه‌سپێ وه‌ك سریش؛ ۴) ریپوۆقی چاو ف ۱) لب زیرین؛ ۲) لبه، كناره؛ ۳) چسپناك؛ ۴) ژفك چشم.

**لچان:** ۱) پڕاوپڕ، دارماڵ؛ ۲) چه‌سپان، نوُسان ف ۱) پر و لبالب؛ ۲) چسبیدن.

**لچاتلچ:** پڕاوپڕ ف لبالب، مالامال.

**لچانلیچ:** لچاتلچ ف لبالب.

**لچ‌بردنه‌وه:** لێوتر ینجاندن، ده‌م‌خواركردنه‌وه ف لب و لوچه درهم كردن.

**لچ‌خوار:** ده‌م‌چه‌فت ف دهن كج.

**لچ‌خواركردنه‌وه:** برێتی له نازه‌زایی‌و قه‌ڵسی ف كنایه از اظهار ناخوشنودی.

**لچ‌خواره‌وكردن:** لچ‌خواركردنه‌وه ف كنایه از اظهار ناخوشنودی.

**لچ‌خولدان:** قسه‌ی به‌په‌له‌كردن ف باشتاب حرف زدن.

**لچ‌خه‌نه:** زه‌رده‌خه‌نه، بزه ف لبخند.

**لچق:** ۱) شتێ كه به ده‌ست‌لێدان ده‌ست لوُس ده‌كا؛ ۲) شیر ینچك ف ۱) لزج؛ ۲) مزهٔ شیرین لزج.

**لچ‌قه‌وی:** لێونه‌ستوُر ف لب كلفت.

**لچـك:** ۱) سه‌رپۆشی ژنانه؛ ۲) كلكه‌ی سه‌رپۆشی ژنانه؛ ۳) كلكه‌ی پێچی سه‌ری پیاوانه؛ ۴) ده‌م‌هه‌ڵبه‌ست، ده‌سماڵێ كه پیاو ده‌م‌و لوُتی پێ داده‌پۆشن ف ۱) لچك؛ ۲) دنبالهٔ سرپوش زنانه؛ ۳) دنبالهٔ فروهشتهٔ دستار مردانه؛ ۴) نقاب.

**لچن:** لچ‌قه‌وی ف لب كُلفت.

**لچۆ:** لچن، لێونه‌ستوُر ف لب كُلفت.

**لچ‌ولێو:** ده‌م‌و لێو ف لب و لوچه.

**لچ‌ولێوكردن:** لێو بڕین بۆ جزیادان ف لب بریدن برای تنبیه.

**لچه:** ۱) لچن؛ ۲) جۆرێ ماسی ف ۱) لب كلفت؛ ۲) نوعی ماهی.

**لچ‌هه‌ڵقرچان:** برێتی له شاندانی تۆڕه‌یی ف كنایه از اظهار ناخشنودی.

**لچ‌هه‌ڵقرچاندن:** لچ‌هه‌ڵقرچان ف كنایه از اظهار ناخشنودی.

**لچ‌هه‌ڵقوتاندن:** لچ‌هه‌ڵقرچان ف كنایه از اظهار ناخشنودی.

**لچ‌هه‌ڵقوتان:** لچ‌هه‌ڵقرچان ف كنایه از اظهار ناخشنودی.

**لچ‌هه‌ڵوگه‌ڕانن:** ۱) لێو به‌ره‌وژوُر نوشتاندنه‌وه؛ ۲) لێوار نوشتاندنه‌وه ف ۱) لب برگرداندن؛ ۲) لبه برگرداندن.

**لچ‌هه‌ڵه‌وگه‌ڕانن:** لچ‌هه‌ڵوگه‌ڕانن ف نگا: لچ‌هه‌ڵوگه‌ڕانن.

**لحیم:** لحێم، جۆشدانی كانزا ف لَحیم.

**لحێم:** جۆش‌خواردن‌و جۆشدانی كانزا ف لَحیم.

**لحێف:** لێفه، سه‌ره‌نتازی په‌موُ تێخزاو ف لحاف.

**لخاف:** لغاو، هه‌وساری له‌چه‌رم‌و ئاسن بۆ ئه‌سپ له سواریدا ف لگام.

**لخو:** له‌سه‌رخۆی ف برخودش.

**لخود:** لخو ف برخودش.

**لخۆدان:** ۱) به‌چه‌پۆك سینگ‌و سه‌ركوتان؛ ۲) به‌خۆداهاتن‌و گه‌شه‌كردن ف ۱) سینه‌زنی؛ ۲) شكوفاشدن.

**لخۆكرن:** ده‌به‌رخۆكردن: (كراسی خۆ **لخۆكه**) ف پوشیدن.

**لخۆگرتن:** ده‌سته‌به‌ربوُن، بڕیاردان ف متعهدشدن.

**لخیز:** ۱) لیچق؛ ۲) شلك‌و شیاوی بادان‌و پێچدان ف ۱) لزج؛ ۲) انعطاف‌پذیر.

**لرپ:** لرفه، ده‌نگی خواردنی زۆرخۆر ف نگا: لرفه.

**لرچه:** خرخری سنگ ف صدای خش خش سینه.

**لرچه‌لرچ:** لرچه‌ی زۆر ف خش‌خش پیاپی سینه.

**لرخ:** خرخری سنگ، لرچه ف خش خش سینه.

**لرخاندن:** خرخركردنی سنگ ف خش خش كردن سینه.

**لرخن:** كه‌سێ كه خره له سنگی دێت ف كسی كه سینه‌اش خش‌خش كند.

**لرخه:** لرخ ف نگا: لرخ.

**لرسه:** سوُران، زفران ف چرخش.

**لرف:** ۱) قوُت‌چوُنی به‌په‌له؛ ۲) ده‌نگی لافاوی به‌ته‌وژم؛ ۳) ده‌نگی

گرگرّی تەندوُر؛ ۴) دەنگی بوّلاّندنی بەقەو ف ۱) بلع شدن با شتاب؛ ۲) صدای خروش سیلاب؛ ۳) غُرّش تنور مُشتَعل؛ ۴) صدای لندیدن با صدای بلند.

**لرفدان:** قوُتدان بەپەلە ف بلعیدن باشتاب.

**لرفە:** لرف ف نگا: لرف.

**لرفەلرف:** لرفی بەشویٚنیەکا ف «لرف» پیاپی.

**لرقە:** تریقەی خەنین ف صدای خندیدن.

**لز:** گیایەکی گەلاّپانی دەشتەکیە. *وەك ژەهر گیاندار ئەکوژیٚ* ف گیاهی است سمّی.

**لزگ:** لك، لق، پەلی رّوەك ف جوانه.

**لژ:** لج ف نگا: لج.

**لژنە:** جڤات، کوٚمەڵی مروٚ کە بوٚ راویٚژ لیٚك کوٚبوُنەتەوە ف گردهم‌آیی.

**لستن:** خواردن بە زمان‌پیٚداساوین ف لیسیدن.

**لستنەوە:** لستن ف لیسیدن.

**لستەوپستە:** پاك لستنەوە، زوٚر تەواو لستن ف کاملا لیسیدن.

**لستەوپستەدان:** پاك لستنەوە ف کاملا لیسیدن.

**لسکە:** هوٚگر، خوٚپیٚ گرتوُ ف مأنوس، الفت گرفته.

**لسەر:** ۱) سەرکەوتو، لەپیٚش لە ئەزموندا؛ ۲) لەلای سەرو؛ ۳) نزیك بە: (لسەر زاینە) ف ۱) موفّق در امتحان؛ ۲) طرف بالا؛ ۳) در شُرُفِ، مُشرف به.

**لسەرخوٚ:** ۱) بەپشو، خاوەن حەوسەلە؛ ۲) هیٚدی‌و بە ئەسپایی ف ۱) شکیبا؛ ۲) آهسته و آرام.

**لسەرخوٚرّا:** دەگەڵ ئەوەشا کە بوٚخوٚشی وایە ف با اینکه خود نیز چنین است.

**لسەرڤەبون:** چوُنەوەسەر، ناسینەوە ف بەجا آوردن، بازشناختن.

**لشتش:** ۱) لستنەوە؛ ۲) بەحاستەم‌و دوبەلا ویٚك کەوتن ف ۱) لیسیدن؛ ۲) مخفیانه تماس گرفتن.

**لشتن:** لستن ف لیسیدن.

**لشتە:** زمان‌پیاساوراوی خوراو ف لیسیده.

**لغاف:** ئامرازیٚکی ئاسنینە دەخریٚتە دەمی ئەسپی سواریەوە. *دەستەجڵەوی پیٚوەیە* ف لگام.

**لغاو:** لغاف ف لگام.

**لغاوبوٚشل کردن:** بریٚتی لە رّیٚگەدان بە کەسیٚ کاری سەربەخوٚ بکا ف کنایه از آزادگذاشتن آدم خودسر.

**لغاوکردن:** ۱) لغاو لە دەمی ئەسپ کردن؛ ۲) بریٚتی لە گیٚرّانەوە لە کار، ریٚگەنەدان ف ۱) لگام زدن؛ ۲) کنایه از منع کردن کسی از کاری.

**لغاوگرتن:** ۱) برینداربوُنی دەمی ئەسپ لە لغاوەوە؛ ۲) جڵەوگرتنی سوار کە دابەزیٚ ف ۱) لگام گرفتگی، زخمی شدن دهان اسب از لگام؛ ۲) افسارگرفتن اسب تا سوار پیاده شود.

**لغاوە:** لالیچ، گوٚشەی دەم ف گوشهٔ دهان.

**لغاوەبرکیٚ:** نەخوٚشی برینداربوُنی سوُچی دەم ف بیماری گوشهٔ دهان.

**لغاوەبریٚ:** لغاوەبرکیٚ ف بیماری گوشهٔ دهان.

**لغاوەگورگە:** مەلیٚکە لە دماوان دەژی ف پرنده‌ای است که در کنار رودخانه می‌زید.

**لغاوهەلبرّین:** ۱) دەسکەجڵەو بڵندکردن؛ ۲) دەسکەلغاو بە چەقوٚ لەت‌کردن ف ۱) لگام برکشیدن؛ ۲) دستهٔ لگام بریدن.

**لف:** ۱) پیٚچ، پیٚچدان؛ ۲) وەك، چون، ویٚنەی؛ ۳) ئاواڵ‌دوانە ف ۱) پیچ، پیچش؛ ۲) همانند، مانا؛ ۳) همزاد، دوقلو.

**لفانە:** ۱) دوانە، جمك، جوُی؛ ۲) شەنگڵەبەرەکەتە ف ۱) دو قلو؛ ۲) دومیوهٔ بهم چسبیده.

**لفت:** ۱) قسەی دڵخوٚشکەرە، دەگەل گفت دەگوترێ: (گفت‌و لفتی خوٚشە)؛ ۲) خەلاس کردنی خواردن: (**لفت**و لیٚسی‌دا) ف ۱) لطف و مهربانی؛ ۲) تمام کردن و خوردن همهٔ خوراك.

**لفتە:** سوُکەناوی لوتفەللا، ناوە بوٚ پیاوان ف مخفّف لطف‌اللّه.

**لفتیٚ:** لفتە ف نگا: لفتە.

**لفك:** ۱) پەلکەی سەرپیٚچی پیاوان؛ ۲) کلکەی دەسماڵی سەری ژنان؛ ۳) شتیٚ سپی‌و زبرە لە خوری یان لە پرزی گیا دەچنریٚ‌و لە حەمام خوٚی پیٚ دەشوٚن ف ۱) دنبالهٔ فروهشتهٔ دستار؛ ۲) دنبالهٔ سرپوش زنانه؛ ۳) لیف حمّام.

**لفکە:** لفك ف نگا: لفك.

**لفکەشامی:** گیایەکە وەك لفکی حەمام بەکاردیٚت ف گیاهی است به جای لیف حمّام به کار آید.

**لفگرتن:** ژن‌هیٚنان‌و شوگرتن ف همسرگرفتن.

**لفگری:** لفگرتن ف همسرگرفتن.

**لفگیری:** لفگرتن ف همسرگرفتن.

**لفلف:** گیایەکە بنەکەی دەخوریٚ ف گیاهی است با پیازهٔ خوردنی.

**لفە:** ئاواڵ‌دوانە ف همزاد.

**لفەدوانە:** دوانە، جمك، جوُی ف دوقلو.

**لڤ:** جوُڵە، بزوتن، بزاو ف حرکت.

**لڤا:** لوا، بەرگن، توُکی وشترو بەرخ ف پشمِ شتر و برّه.

**لڤاندن:** بزواندن، جوُلاّندن ف حرکت دادن.

**لڤتا:** لیٚرە، لەگرە، لەم‌شویٚنە ف در اینجا.

**لڤد:** درٚکیٚکە بەپنج دەرّویٚ ف خاربُنی است بوته‌ای.

**لڤر:** لڤتا، لەگرە ف دراینجا.

**لڤرە:** لڤر ف دراینجا.

**لڤك:** لوُ، گریٚ لە گوٚشتی لەشدا ف غدّه.

**لڤن:** خشت، کەرپیچ، کەرپوچ ف خِشت.

**لڤوٚك:** بزوٚز، دانەسەکناو، بیٚ‌ئوٚقرە ف بی‌آرام، همواره در جُنب وجوش.

**لڤەك:** لڤوٚك ف بی‌آرام.

**لڤی:** ۱) لەئەم، لەمە؛ ۲) جوُلاّ، وەجوُڵەکەوت ف ۱) ازاین؛ ۲) حرکت کرد، جُنبید.

**لڤی‌دەرە:** لەم‌جیٚگەیە، لەشویٚنە ف در اینجا.

**لڤیٚ‌دەری:** لەوشویٚنەی دوُر ف در آنجا.

**لڤیٚ‌دەریٚ:** لڤیٚ‌دەری ف درآنجا.

**لقین:** جوڵان، بزوتن [ف] جنبیدن، حرکت کردن.
**لق:** ۱) پەلی دار؛ ۲) قوڵـەی لەشکـر کە دەکـاتە سێ‌یەکی هێز [ف] ۱) شاخه؛ ۲) گُردان ارتش.
**لقاو:** لغاو [ف] لگام.
**لق لق:** ۱) پەل‌پەلـــی دار؛ ۲) قاقـــا، خەنـین بەدەنـگـی بەرز [ف] ۱) شاخه‌شاخه؛ ۲) قهقهه.
**لقلقی:** جۆرێ ترێ [ف] نوعی انگور.
**لك:** ۱) لق، پەلی دار؛ ۲) پەلکەی دەسماڵ؛ ۳) سوُچ و گۆشەی ڕایەخ و قوماش و...؛ ۴) خڕایی ڕەق لە بن پێست؛ ۵) گرێ؛ ۶) چەسپ وەك سرێش [ف] ۱) شاخه؛ ۲) دنبالۀ فروهشتۀ سرپوش و دستار؛ ۳) گوشۀ زیرانداز و پارچه و...؛ ۴) غُدّه؛ ۵) گره؛ ۶) چسب.
**لکا:** چەسپا [ف] چسبید.
**لکـار:** ۱) حەریك، مژوُڵ بە حەبـاب؛ ۲) دەکـارهێنراو، کارکردو [ف] ۱) مشغول کار؛ ۲) نیمداشت، کارکرده.
**لکان:** چەسپان [ف] چسبیدن.
**لکاندن:** چەسپاندن [ف] چسبانیدن.
**لکانن:** لکاندن [ف] چسبانیدن.
**لکاو:** حەسپاو [ف] چسبیده.
**لك‌لك:** ۱) بازەباز، هاوارکردنی مەڕو بزن؛ ۲) پێکەنینی بەدەنگ بەرز [ف] ۱) صدای بلند بز و گوسفند؛ ۲) قاەقاه خندیدن.
**لك‌مامیر:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد [ف] نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.
**لکمل:** ئاڵو،بادامە [ف] لوزتین.
**لکوُ:** لەکام‌جێ؟ [ف] درکجا؟.
**لکوپۆ:** لق و پەلی دار [ف] شاخسار.
**لکوپۆپ:** لق و سەرلق [ف] شاخه و بالائیهای درخت.
**لکوژاندن:** لەوەڕ لەسەر تازەڕواو، ئاخەلێوە کردنی ئاژەڵ [ف] چریدن از گیاه نودمیده در اوایل بهار.
**لکولۆ:** رەقاییەکانی بن پێست [ف] غدّه‌ها.
**لکومین:** هەڵەنگوُتـن، ساتمەبـردن، ڕەت‌بردن و کەوتن [ف] سکندری خوردن.
**لکه:** ۱) گرێ؛ ۲) لق؛ ۳) پەڵە [ف] ۱) گره؛ ۲) شاخه؛ ۳) لکه.
**لکه‌کۆره:** گرێ‌کۆرە [ف] گره کور.
**لکه‌کۆرێ:** گرێ‌کۆرە [ف] گره کور.
**لکی:** ۱) لە کـام کـەس؟؛ ۲) لکا، چەسپـا [ف] ۱) از چه کسـی؟؛ ۲) چسبید.
**لکیا:** لکا، چەسپا، پێوەنوُسا [ف] چسبید.
**لکیاگ:** لکاو [ف] چسبیده.
**لکیان:** لکان [ف] چسبیدن.
**لکیده‌ره:**لەکوێ‌یە؟، لەکام‌شوێنە؟ [ف] کجاست؟.
**لکیده‌رێ:** لەکام‌جێ؟، لەکام‌شوێن؟ [ف] کجا؟.
**لکین:** لکان [ف] چسبیدن.
**لکیو:** لکاو [ف] چسبیده.
**لگبن:** ۱) خشتی کاڵ؛ ۲) ناوی گونـدێکە لە کوردستان [ف] ۱) خشت خام؛ ۲) نام دهی است.
**لگۆره‌ی:** بەپێ [ف] برطبق.
**لگۆری:** بەپێ، لگۆرەی [ف] برطبق.
**للا:** هۆی کاورا!، ئەرێ‌فلان! [ف] فلانی!.
**لم:** ۱) ڕەمـڵ، ڕەلم؛ ۲) زگ؛ ۳) سەبەب؛ ۴) فم‌کردنی چلم؛ ۵) لیچی سەرەوەی بەراز [ف] ۱) ماســـه؛ ۲) شکم؛ ۳) انگیزه؛ ۴) فین؛ ۵) لب زَبَرین گُراز.
**لماو:** قوڕاوی لم، لم و ناوی تێکەڵاو [ف] لای و لجن.
**لمبۆز:** پۆز، دەم و کەپۆی حەیوان [ف] پوزه.
**لمبیز:** لمبۆز [ف] پوزه.
**لمبیس:** لمبۆز [ف] پوزه.
**لمت:** لماو [ف] لای، لجن.
**لمتش:** ۱) وەشارتن؛ ۲) ژێرخاك‌کردن، ناشتن [ف] ۱) پنهان کردن؛ ۲) دفن کردن.
**لمك:** خوێواوك، تراوی زۆر سوێر [ف] مایع بسیار شور، آب نمک.
**لمن:** ۱) بۆ من: (وای **لمن**)؛ ۲) لە من: (**لمن** ڕا بۆ تۆ) [ف] ۱) برمن؛ ۲) از من.
**لموڕ:** ۱) لمبۆز، پۆز؛ ۲) ڕوگرژ، ناوچاوترش [ف] ۱) پوزه؛ ۲) اخمو.
**لمۆز:** لمبۆز [ف] پوزه.
**لموز:** لمبۆز [ف] پوزه.
**لموززراڤ:** جۆرێ ماسی، باقۆ، نەقە [ف] ماهی اوزُن‌برون.
**لمه:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد [ف] نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.
**لمه‌د:** نمەد، لباد، کولاو [ف] نمد.
**لنـــج:** ۱) لاســـار، گوێ‌نەبیس، پێ‌چەقێن؛ ۲) لچق؛ ۳) سەرکـۆنـە، سەرزەنشت؛ ۴) حەڕی، هەڕگ، قوڕ؛ ۵) لیتە، قوڕاوی زۆر شل [ف] ۱) لجباز؛ ۲) لَزِج؛ ۳) سرزنش؛ ۴) گِل؛ ۵) لای و لَجَن.
**لنچق:** لچق [ف] لَزِج.
**لنگ:** ۱) لاق، لە بەری پێوە تا ڕان؛ ۲) تا، بەرانبەر: (یەك **لنگ** جەواڵ، تەم کەوشانە **لنگاولنگ** کەوتون)؛ ۳) غار، ڕاکردن: (**لنگ** دە بزانم) [ف] ۱) لِنگ؛ ۲) لنگه؛ ۳) دَو.
**لنگ‌ئەشتش:** پێ‌پێدانان، بەرپێ‌دان [ف] زیرپا گذاشتن، پا برچیزی گذاشتن.
**لنگ‌ئەشتش ڤەر:** بەشەق تێ‌هەڵدان [ف] تیپازدن.
**لنگار:** غاری بەپڕتاو، چوارناڵە [ف] تاخت.
**لنگاران:** ڕکەی غاردان، گرێوەغار [ف] مسابقۀ دَو.
**لنگاردان:** بەپڕتاو غارپێ‌کردن، چوارناڵە بە ئەسپ کردن [ف] با تاخت دوانیدن.
**لنگدان:** ۱) ڕاکـردن، غاردان؛ ۲) غارپـێ‌کردن [ف] ۱) دویـدن؛ ۲) دوانیدن.

**لنگرین:** شەلین، لەنگین، بەقاچ سەقەتی بەڕێوەچوُن ف لنگیدن.

**لنگ‌قەرسین:** تەزینی لاق، مروچانەکردنی پا ف مورمورکردن پا.

**لنگ‌مەتك:** ۱) پێ‌پان؛ ۲) برێتی لە شوُم ف ۱) پهن پا؛ ۲) کنایە از شوُم.

**لنگو:** هەویرترش، گوتکەهەویر کە بۆ هەویرترش هەڵدەگیرێ ف چونهٔ خمیرمایە.

**لنگــە:** ۱) تا، وەك: (**لنگــە**ی لە دنیادا نیە)؛ ۲) تابـار؛ ۳) تاکـەوش‌و گۆرەوی؛ ۴) جەواڵی زۆر گوشادو زل، هوڕ؛ ۵) لنگ، لاق، پا، قاچ؛ ۶) بەردێکی دەستـاڕ ف ۱) همتـا؛ ۲) لنگـەبـار؛ ۳) لنگـهٔ کفش و جوراب؛ ۴) جوال گشاد و بزرگ؛ ۵) پا؛ ۶) سنگ دستاس.

**لنگـەئەستەنە:** ۱) پێ‌پیانان، بەرپێ‌دان؛ ۲) بازهاویشتن، بازبردن ف ۱) پا بر چیزی گذاشتن؛ ۲) پرش.

**لنگەتللوُر:** لەسەر زگ درێژبوُن ف دَمَر دراز کشیدن.

**لنگەتلوُر:** لنگەتللوُر ف دمر دراز کشیدن.

**لنگەشە:** قۆرتە، گورگەلۆقە ف هَروَله.

**لنگەشەلە:** هەنگڵەشەلە، ڕۆیشتن لەسەر لاقێك ف لَی‌لی رفتن.

**لنگەشەلێ:** لنگەشەلە ف لی‌لی رفتن.

**لنگەفرتە:** لاقەفرتە ف لگدپرانی نوکشتە.

**لنگەفرتێ:** لاقەفرتە ف لگدپرانی تازەکشتە.

**لنگەفڕە:** لاقەفرتە ف لگدپرانی تازەکشتە.

**لنگەفڕێ:** لاقەفرتە ف لگدپرانی تازەکشتە.

**لنگەلەرزە:** ئەژنۆلەرزین لە بێ‌تاقەتی‌و ترسان ف لرزش زانو.

**لنگەلەرزێ:** لنگەلەرزە ف لرزش زانو.

**لنگەلەرێ:** لنگەلەرزە ف لرزش زانو.

**لنگەوتللوُر:** لنگەتللوُر ف دَمَر درازکشیدن.

**لنگەوتلوُر:** لنگەتللوُر ف دَمَر دراز کشیدن.

**لنگەوژوُر:** کەوتن‌و قاچ‌بڵندبوُن ف افتادن و پا بە هوارفتن.

**لنگەوقوُچ:** لنگەوژوُر ف نگا: لنگەوژوُر.

**لنگ‌هەڵکراو:** قول‌هەڵمالاو ف نگا: قول‌هەڵمالاو.

**لو:** ۱) گرێ‌و خڕایی سەخت لە بن پێست، لك؛ ۲) سەربـە؛ لەسـەڕ، بۆ عاشیرەتـانی دەڵێن: (زەعفـەران**لو**، حەیدەران**لو**)؛ ۳) لێو؛ ۴) ڕێوی، ڕواس، چتر ف ۲) غدّە؛ ۲) منتسب‌بە؛ ۳) لب؛ ۴) روباە.

**لۆ:** ۱) گیایەکی بەرزەبالای گەلادەرزی‌یە؛ ۲) تیسك، دستە موێکی سەر؛ ۳) تا، تاڵ، داو؛ ۴) قەد، لا: (بـەنەکە دو**لۆ** کەوە)؛ ۵) توێژ، چین؛ ۶) کابرا، کاورا: (وا مەکە **لۆ**)؛ ۷) ئەی خۆرت!، ئەی لاو!: (دە **لۆ لۆ**!)؛ ۸) بۆچی؟، چما؟؛ ۹) بۆ ئەوە، لەبەر ئەمە؛ ۱۰) بۆ، ژ: (**لۆ**منت هینایە، **لۆ** توم هینـایە، **لۆ**م بینـە)؛ ۱۱) جۆر، تەرز: (و **لۆ** نابیتن)؛ ۱۲) لك، لو، گرێ‌گۆشتی ژێر پێست ف ۱) گیاهی است؛ ۲) دستـەموی سر؛ ۳) تار؛ ۴) لا؛ ۵) طبقە، چین؛ ۶) فلانکس، یارو؛ ۷) ای جوان!؛ ۸) کلمهٔ پرسش، چرا؟؛ ۹) برای اینکە؛ ۱۰) برای؛ ۱۱) طور؛ ۱۲) غدّە.

**لوا:** ۱) بەرگن؛ ۲) بەرگنی پەستواو، کولاو؛ ۳) ڕۆیشت؛ ۴) ڕەخسا، هەلم دەسکـەوت: (بوم **لوا** کارەکە بکەم) ف ۱) پشم شتر و برە، کُرك؛ ۲) نَمَد؛ ۳) رفت؛ ۴) ممکن شد.

**لوالەو:** پڕاوپڕ ف لبالب.

**لوان:** ۱) ڕۆیشتن: (بێ زام خەدەنـــگ موژەی مەهـــڕوان/ نەنگـەن وە سارای قیامـەت **لوان**) «مـەولەوی»؛ ۲) ڕەخسان، هەڵکەوتن ف ۱) رفتن؛ ۲) امکان.

**لواوی:** گۆشتی بە لکو لۆ ف گوشت پرغدّە.

**لوای:** ۱) لوان، ڕۆیشتن؛ ۲) ڕۆیشتی ف ۱) رفتن؛ ۲) رفتی.

**لوباندن:** پاڕانەوە، لالانەوە ف لابەکردن.

**لۆپت:** زرنگ‌و چالاك ف زرنگ و چابك.

**لۆبلۆت:** باڕەو کاڕەی بزن‌و مەڕ ف صدای بلند بز و گوسفند.

**لوُبلوُب:** سوُربوُن لەسەر شتێ ف اصرار، ابرام.

**لوبلوبە:** نۆکەسپیلکـەی لەشیرداکولاوی وشکـەوەکراو ف لبلبـی، نخودچی.

**لوُبی:** لۆبیا ف نگا: لوبیا.

**لۆبیا:** دانـــەوێڵەیەکی بەکلوە بە ڕەنگی سپی‌و سوُر دەبێ، ماشـەسپی، ماشەسوُرە ف لوبیا.

**لۆپ:** ۱) فرەنجی؛ ۲) لباد، کولاو، تەحت، تات؛ ۳) سەرکوڵمە، ڕومەت؛ ۴) بەڕەی ئەستوُر؛ ۵) باڵداری مەلەوان وەك مراوی‌و... ف ۱) پالتوی نمـدی؛ ۲) نمد گستردنی؛ ۳) گونە، لپ؛ ۴) کلیم ضخیم؛ ۵) پرندهٔ شناگر مانند مرغابی و...

**لۆپت:** لۆبت ف زرنگ و چابك.

**لۆپـك:** ۱) داوەڵ، داهـۆڵ؛ ۲) لۆبیا؛ ۳) کوتیلك، کفتەی ساوار ف ۱) مَتَرسَك؛ ۲) لوبیا؛ ۳) کوفتەبلغور.

**لۆپکە:** جۆرەکرمێکە گەڵای بێستان دەخوا ف نوعی کرم کە آفت جالیز است.

**لوت:** روُت، بێ‌جلك ف لخت.

**لۆت:** ۱) ڕوُت، بێ‌جل؛ ۲) پاروی زل؛ ۳) بابۆڵە، تیکە؛ ۴) گاف، شەقاو؛ ۵) باز ف ۱) لُخت؛ ۲) لقمهٔ بزرگ؛ ۳) ساندویچ؛ ۴) گام؛ ۵) گام بلند.

**لوُت:** ۱) لوت، ڕوُت؛ ۲) کەپۆ، بێقل، کەپ، دم؛ ۳) ڕەجاڵە، عەلۆجەلۆ: (لات‌و **لوُت**) ف ۱) لُخت؛ ۲) بینی؛ ۳) اوباش.

**لوُتـاوێژ:** بۆگەنی زۆرپیس کە پیاو کەپۆی دەگرێ تا بۆی نەیە ف بوی بسیار بد.

**لوُت‌ئەسترین:** چڵم لەکەپۆکردنەوە ف پاك کردن آب بینی.

**لوُت‌بڕاو:** کەسێ کە سەری بێقلیان بڕیوە لەسەر کاری خراپ ف بینی بریدە.

**لوُت‌بڕیاگ:** لوُت‌بڕاو ف بینی بریدە.

**لوُت‌بڕین:** بێقل‌بڕین ف بینی بریدن.

**لوُت‌بەبەرخۆداهاتنەوە:** برێتی لە پەشیمان‌بوُنەوە ف کنایە از پشیمان شدن.

**لوُت‌بەخـۆداهـاتنـەوە:** برێتی لە خەجـاڵەتی‌و پەشیمانی ف کنایە از خجلت‌زدگی و پشیمانی.

**لۆتبەرز:** بادیھەوا، بەفیز ف متکبّر.

**لۆتبەرزی:** فیز، دەعیە ف تکبّر.

**لۆتپان:** ١) کەپۆپان؛ ٢) مەلێکە لە دماوان دەژی ف ١) بینی پهن: ٢) پرندەای است که در کنار آب زندگی می‌کند.

**لۆتپروانن:** بریتی لە نارەحەت کردن ف کنایە از افسردەخاطرکردن.

**لۆتپژان:** خوێنبەربوونی کەپۆ ف خونریزی بینی، خون دماغ شدن.

**لۆتپیانـەھـێنـان:** لێرازی نەبـوون، نرخ نەدان بە کەسـێ ف ناخوشنودبودن از کسی، ارج ننهادن.

**لۆتچۆزانـەوە:** ١) کەپـۆسۆزیانەوە؛ ٢) بریتی لە لەھومێدەواری یەوە بەسـەر ناھـومێدی داکـەوتن ف ١) سوزش در بینی؛ ٢) کنـایە از نومیدشدن پس از امیدواری، دماغ سوختە شدن.

**لۆتچۆزیانەوە:** لۆتچۆزانەوە ف نگا: لۆتچۆزانەوە.

**لۆتخوار:** قەلس، تۆرە، نارازی ف قهرکردە، ناراضی.

**لۆتخوریان:** بریتی لە خەیاڵ لە کردنی کارێ کردن: (بۆ چۆنەسەفەر **لۆتی نەخورێ**) ف هوس کردن.

**لۆتداژانـدن:** سەردەبـەرخـۆنان بە نارەحەتیو خەمباری ف کنایە از کزکردن و غم خوردن.

**لۆتداژەندن:** لۆتداژاندن ف نگا: لۆتداژاندن.

**لۆتداژەنین:** لۆتداژاندن ف نگا: لۆت داژاندن.

**لۆتدافسیاگ:** لۆتپان ف بینی پهن.

**لۆترەوان:** روقایمو فێڵباز ف شیّاد و پررو.

**لۆتزانەوە:** ئاولەکەپۆهاتن ف آب از بینی سرازیرشدن.

**لۆتزل:** ١) کەپـۆزەلام؛ ٢) بریتی لە لۆتبەرز ف ١) دماغ گندە؛ ٢) کنایە از متکبّر.

**لۆتسۆلانـەوە:** ١) لۆتسۆزیانـەوە؛ ٢) کەپۆبەرزکردنەوەی بارگینو نێرەکـەر لە بۆنکردنی تەرس ف ١) سوزش در بینی؛ ٢) بینی بلنـد کردن اسب و الاغ از بوکردن مدفوع مادە.

**لۆتسۆلیانەوە:** لۆتسۆلانەوە ف نگا: لۆت سۆلانەوە.

**لۆتشکان:** ١) ناھومێدبوون؛ ٢) خەجاڵەتبوون ف ١) نومیدشدن؛ ٢) شرمندەشدن.

**لۆتشکاندن:** ١) تەمێ کردن؛ ٢) ناھومێدکردن ف ١) تنبیەکردن؛ ٢) نومیدکردن.

**لۆتشکانن:** لۆت شکاندن ف نگا: لۆتشکاندن.

**لوتك:** ١) سەما لەخۆشیان؛ ٢) بازبردن ف ١) رقص و پایکوبی انفرادی از شادی؛ ٢) پریدن، جهیدن.

**لۆتك:** لوتك ف نگا: لوتك.

**لۆتك:** قەمتەرە ف قنطرە، پُل ناودانی.

**لوتکە:** ١) ترۆپك؛ ٢) کەپك ف ١) قلّە؛ ٢) دماغە.

**لۆتکە:** بەلەم ف قایق.

**لۆتگرتن:** ١) دەس بەکەپۆگرتن لە بۆگەن؛ ٢) بریتی لە لالۆتی ف ١) بینی گرفتن از بوی بد؛ ٢) کنایە از ناخوشنودی از کسی.

**لۆتگیران:** بریتی لە ئالامەتگرتن ف بینی گرفتگی از زکام.

**لۆتگیریان:** لۆتگیران ف گرفتگی بینی از زکام.

**لۆتلاگرتن:** لالۆتبوون ف دلگیرشدن، ناخوشنودشدن از کسی.

**لۆتلێخوران:** خەیاڵ لێ کردنو بەتـەمـابـوون، لۆتخوران ف هوس کردن چیزی.

**لۆتم:** بەش، پشك، پاژ ف سهم، حصە.

**لوتو:** جۆرێ ماسی ف نوعی ماهی.

**لۆتو:** بۆ تۆ ف برای تو.

**لۆتۆ:** بۆ تۆ، ژ تەرا ف برای تو.

**لۆتو بزۆت:** لەپڕ و نەکاو: (**لۆتو بزۆت** تۆشی بوم) ف یکهو، ناگاه.

**لۆتو پۆت:** ١) زۆر رۆتو نەدار؛ ٢) بۆڵەو پرتە ف ١) فقیر ژندەپوش؛ ٢) غرولند.

**لۆتە:** ١) ترێی پڵیشاو؛ ٢) بەرماوی تێکەڵ کراو؛ ٣) بۆ تۆ؛ ٤) پاروی زل؛ ٥) ترێی ھەڵخـراو لەبـەر تاو بۆ بوونـەمێوژ ف ١) انگـور لهیدە: ٢) بازمـانـدۀ خوراك دورریختنی؛ ٣) برای تو؛ ٤) لقمـۀ بزرگ؛ ٥) انگوری که برای تبدیل بە کشمش در معرض تابش آفتاب قرار می‌گیرد.

**لۆتە:** ١) کەپك؛ ٢) ترۆپکی چیا؛ ٣) کەپۆزل؛ ٤) رۆتەو پۆتەکە؛ ٥) ژنی بەنازو شەرمێون ف ١) دماغە؛ ٢) قُلّە؛ ٣) دماغ گندە؛ ٤) آدم کوچك بی‌نمود؛ ٥) زن طنّاز.

**لۆتھاتنەخوارەوە:** ١) لۆتشکان؛ ٢) لە فیز وازھێنان ف ١) کنایە از تنبیەشدن؛ ٢) از تکبّردست برداشتن و پست شدن.

**لۆتەخۆر:** بابۆڵەبادەر، پاروی‌زلخۆر: (وا خوانی کەناری من بۆ نوقڵی دەمو ماچە/ ئەی **لۆتەخۆری** تەکیە سا تۆ لە کەنارت چی؟) «نالی» ف کنایە از بی‌احترام.

**لۆتەر:** ١) زرنگو چالاك؛ ٢) تەشی؛ ٣) گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف ١) زرنـگ؛ ٢) دوك؛ ٣) نام روستایی در کردستان کە توسط بعثیان ویران شد.

**لۆتەلا:** لالۆت ف قهرکردە، دلخور.

**لۆتەلۆت:** پرتەو بۆڵە ف غرولند.

**لۆتەوانە:** ١) خەزێم؛ ٢) سەردەرانەی زەق ف ١) زیور بینی، گل بینی؛ ٢) آستانۀ برامدە.

**لۆتھەڵکردن:** لالۆتی شاندان، لالۆتبوون ف قهرکردن.

**لۆتی:** ١) بەزمگێری بە زورناو دەھۆڵ؛ ٢) بریتی لە بێ حەیا؛ ٣) بریتی لە دەستبڵاو ف ١) خُنیاگر؛ ٢) کنایە از بی‌شرم؛ ٣) کنایە از دست و دل باز.

**لۆتیاتی:** کاری لۆتی ف «لۆتی»گری، «لۆتی»بودن.

**لۆتیایەتی:** لۆتیاتی ف نگا: لۆتیاتی.

**لۆتی‌خور:** دەسبری بێ‌شەرمانە ف کُلاەبرداری.

**لۆتی گەری:** لۆتیاتی ف نگا: لۆتیاتی.

**لۆتی‌وپۆتی:** عەلۆجەلۆ، رۆتو رەجاڵە ف اَوباش.

**لۆتیەتی:** لۆتیاتی ف نگا: لۆتیاتی.

**لۆج:** ژووری تایبەتی لە تەماشاخانەو سینەمادا ف لُژ.

**لۆجن:** دوکەڵ کێش ف دودی.

**لوچ:** ۱) چرچ؛ ۲) لچ، لێوی خوارو؛ ۳) خزگەی ماسی ف ۱) چروك؛ ۲) لوچه؛ ۳) جای گردآمدن ماهیان در زمستان.

**لۆچ:** ۱) چرچ؛ ۲) بۆ چی؟، چما؟، لۆ؟ ف ۱) چین، چروك؛ ۲) کلمهٔ پرسش، چرا؟.

**لۆچان:** چرچ بوون ف چروکیدن.

**لۆچاو:** ۱) شەپۆلی پچوکی سەر زۆبار؛ ۲) بۆ چەم، بۆ چاو: (ئەم دەرمانە لۆچاو باشە) ف ۱) خیزاب؛ ۲) برای چشم.

**لۆچاوی:** چرچ ف چروکین.

**لۆچکاندن:** جاوین، جوون ف جویدن.

**لۆچکە:** قەفانچەلەی ناڵبەند کە لێوی یەکسمی پێ دەبەستن، لەواشە ف لباشن.

**لۆچە:** ۱) لێوی خواروی یەکسم؛ ۲) وتەی پرسیار، بۆ چی؟ ف ۱) لب زیرین ستور؛ ۲) کلمهٔ پرسش، چرا؟.

**لۆچی:** ۱) لۆچاوی؛ ۲) بۆچی؟، چما؟ ف ۱) چروکین؛ ۲) برای چه؟.

**لۆخ:** ۱) پەردەی تەنك نێوان گۆشتو پێستی زیندو؛ ۲) داری گەندەڵ؛ ۳) بەفری شل کە زوو دەتوێتەوە؛ ۴) جێگەی ئامراز: (فیشەك لۆخ)؛ ۵) توێ، توێژ؛ ۶) شیرنی خەرمان سووربوون؛ ۷) گوڵی وشکی قامیش ف ۱) غشاء؛ ۲) چوب پوسیده؛ ۳) برف سُست که زود آب می‌شود؛ ۴) جای ابزار؛ ۵) لایه؛ ۶) انعام به مناسبت برداشت خرمن؛ ۷) خوشهٔ خُشك نی.

**لۆخان:** بەزمو زەماوەند: (شای لۆخان) ف بزم و سرور گروهی.

**لۆخانە:** ۱) ئـەندامێکی پرچرچو لوچە لە ناو کرش دا؛ ۲) بەخشش بە هۆی خەرمـان سووربـوون ف ۱) هزارلا درسیرابی؛ ۲) انعام خرمن برداری.

**لۆخواردن:** تێك ئالانو ئالۆزانی بەن ف درهم شدن نخ.

**لۆد:** ۱) بارەگیا؛ ۲) لۆدەگیاو گزرەو کا ف ۱) بار گیاه؛ ۲) تودهٔ علوفه.

**لۆدە:** ۱) کۆمای زل لە کاو گیا؛ ۲) رووەبەراز ف ۱) تودهٔ برهم انباشتهٔ علوفە؛ ۲) رمهٔ خوك.

**لودێ:** بڕۆن ف بروید.

**لۆر:** لەوێ، لەوێندەرێ ف درآنجا.

**لوڕ:** ۱) بەشێکـــە لە چواربـــەشی گەلی کورد؛ ۲) پالانێکی باریکی دوفلیقانەیە لە بن جلەوە دەیخەنە سەر پشتی بارەبەر ف ۱) لُر، بخشی از چهاربخش ملّت کورد؛ ۲) قسمتی دوشاخه مانند از پالان ستور.

**لۆڕ:** ۱) خواردنێکە لە شیر و تیژاوی پەنیر دەکرێ؛ ۲) دەنگی بلوێر؛ ۳) گۆرانی گوتنی بەسـەبـر: (لـەبەر خۆیەوە لۆرەلۆریەتی)؛ ۴) جێگە، شوێن؛ ۵) کردە، ئاکـار؛ ۶) ڕۆیشتنی بە شلەپەتەیی؛ ۷) چلۆنایەتی، بار؛ ۸) لایلای بۆ زارۆکی ساوا ف ۱) لور، از فراوردەهـای شیر؛ ۲) آواز نی؛ ۳) زمزمه و ترنّم؛ ۴) جای، مکان؛ ۵) روش؛ ۶) شل وول راه رفتن؛ ۷) حالت، کیفیّت؛ ۸) لالایی برای نوزاد.

**لۆڕ:** ۱) حەبـەی درێژی سەگو گورگو چەقەڵ؛ ۲) دەنگی بلوێر؛ ۳) راستو تەخت؛ ۴) پێچدراو: (چـاوان مەرێژە بسکـان مەکە لۆڕ)؛ ۵) بەتەوژم سەرەوژێرهاتنی باڵدار: (بازەکە لۆڕ بۆوە بۆ کەو) ف ۱) زوزه؛ ۲) آواز نی لبك؛ ۳) راست و هموار؛ ۴) پیچ خورده؛ ۵) شیرجهٔ پرندهٔ شکاری.

**لۆراسی:** ۱) جەبـەزی درێژوکـە؛ ۲) کدوی درێژ ف ۱) نوعی هندوانهٔ دراز؛ ۲) نوعی کدوی دراز.

**لۆراندن:** ۱) گۆرانی کوتنی بەسەبر؛ ۲) گریان بە دەنگی گڕو لەرزۆك؛ ۳) لایلایی دایك بۆ منـاڵ ف ۱) ترنم کردن؛ ۲) گریستن با صدای خشن و لرزان؛ ۳) لالایی مادر برای کودك.

**لۆڕاندن:** ۱) دەنگی درێژی سەگو گورگو چەقەڵ؛ ۲) دەنگی گێژاوی بەتەوژم: (گێژاو لۆڕەی دێ) ف ۱) زوزه کشیدن؛ ۲) صدای گرداب پرحرکت.

**لۆراندنەوە:** ۱) دەنگدانی بلوێر؛ ۲) لۆراندن ف ۱) صدای نی؛ ۲) نگا: لۆراندن.

**لۆرانەوە:** لۆراندنەوە ف نگا: لۆراندنەوە.

**لۆرت:** زۆر دەوڵەمەندو پارەدار ف بسیار ثروتمند، لُرد.

**لۆرتە:** ترێی پلیشاو، لۆتە ف انگور لهیده.

**لۆرد:** لۆرت ف بسیار ثروتمند، لُرد.

**لۆرك:** ۱) لۆر کە لە شیر دەکرێ؛ ۲) ئەسرین؛ ۳) لای‌لایە ف ۱) لور، از فراوردەهای شیر؛ ۲) اشك؛ ۳) لالایی.

**لۆڕك:** ژاڵە، رووڵ، رووڵك ف گل خرزهره.

**لۆرکردن:** پێچدان ف پیچیدن، تاب‌دادن.

**لۆرکنایش:** لایلایی کردن ف لالایی.

**لورکوژ:** جۆرێ ترێ ف نوعی انگور.

**لۆرکە:** جۆرەقامێکە ف آهنگی است.

**لۆرە:** ۱) گۆرانی بەسەبر؛ ۲) گریان بە دەنگی گڕ؛ ۳) دەنگی بلوێر؛ ۴) قامێکە ف ۱) ترنّم؛ ۲) گریه با صدای خشن؛ ۳) آواز نی؛ ۴) آهنگی است.

**لۆڕە:** دەنگی لۆڕاندن ف زوزه.

**لۆرەپ:** ئەوجێگە لە گوان کە شیری لێ‌دێتەدەر ف لولهٔ پستان.

**لۆرەلۆر:** لۆرەی بەشوین یەکا ف «لۆرە»ی پیاپی.

**لۆڕەلۆڕ:** لۆڕەی بەشوێن یەکا ف زوزهٔ پیاپی.

**لۆرەلەپ:** داری لوسی گروفەر بۆ پێشو دواوەی مەشکە کە داردۆژنگی بە زمانە تێخراوە ف چوب دستگیرهٔ مشك بهم زنی.

**لۆڕی:** ۱) کورتـانۆکەی دوفلیقانە، لوڕ؛ ۲) زاراوەی لوڕ ف ۱) پالانچهٔ دوشاخه؛ ۲) لهجهٔ لُری.

**لۆری:** ۱) تەگەی خوازراوە، نێری وردەماڵان؛ ۲) ترومبیلی باری؛ ۳) لای‌لای ف ۱) تگه‌ای که به عاریه به گلهٔ دیگران برند؛ ۲) کامیون؛ ۳) لالایی.

**لۆڕی:** لایە، دەبنو ف لالا بچه، بخواب.

**لۆریاسی:** لۆراسی ف هندوانهٔ دراز.

**لۆریانەوە:** لەبەرخۆوە گۆرانی گوتن، لۆرانەوە ف زمزمهٔ زیرلبی.

**لۆڕی‌لۆڕی:** لای لایە ف لالا.

**لۆرین:** سەرکۆنە، سەرزەنشت ف سرزنش.
**لۆرینەوە:** لۆرانەوە ف زمزمهٔ زیرلبی، ترنّم.
**لوزم:** گەرەك، ئەشێ ف لازم است.
**لۆزەندەر:** زەبەلاحی تەژە ف لندهور.
**لوُزەو:** ۱) خزینی شتی وردبە پڕایی: (جەواڵ دڕا گەنم **لوُزەوی کرد**)؛ ۲) دەرچوُنی ئاو لە کونو قەڵشتەوە بە تەوژمی: (**لوُزەوم** بەردەسەرێ نامەوێ جورعەی کەم کەم) «هێمن»؛ ۳) سواری زۆرو بەپەلە: (**لوُزەوی** سواران سەری کرد) ف ۱) ریزش دانەها در پی هم؛ ۲) ریزش آب با فشار؛ ۳) گروه سواران شتابزده.
**لۆژ:** ۱) تەمەڵ، قوُنگران؛ ۲) راکشاو لە درێژەوە، تخێڵ؛ ۳) بزوُتن بەولاولادا، راژان؛ ۴) لۆج ف ۱) تنبل، سرگردان؛ ۲) درازافتادە برزمین؛ ۳) جنبش، لرزش افقی؛ ۴) لُژ.
**لۆژان:** ۱) تخێڵ بوُن؛ ۲) راژان ف ۱) دراز شدن بر زمین؛ ۲) نوسان افقی.
**لۆژاندن:** بەزەویدا تخێڵ کردن ف بە درازا بر زمین انداختن.
**لۆژانن:** لۆژاندن ف نگا: لۆژاندن.
**لوژن:** دوکەڵ کێش، کونی بوغاری ف دودکش.
**لوژنا:** ۱) خەتی جوُت، هێڵ؛ ۲) جۆگەی بچوُك لەناو کێڵگەدا ف ۱) شیار شخم؛ ۲) جوی کوچك در مزرعە.
**لۆژە:** ۱) تەمەڵی، قوُنگرانی؛ ۲) بزاوی بە هەردوك لای راستەو چەپەدا ف ۱) کسلی، تنبلی؛ ۲) نوسان افقی.
**لۆژەلۆژ:** ۱) سەبەرەسەبەرە ڕۆیشتن؛ ۲) بە لارەوەلارەوە ف ۱) سلاّنەسلاّنە؛ ۲) یك وَری.
**لۆژین:** لۆدەی گیاو گزرە ف تودهٔ برهم انباشتهٔ علوفە.
**لۆس:** ۱) گوپ لە لای ژوُری زارەوە؛ ۲) چەند دارێ کە چەند کەس دەیدەنە بن شتێ گرانو قورس بۆ هەڵگرتنی؛ ۳) باری، نوێڵ؛ ۴) لەبەر زۆرکارکردن ساویاو؛ ۵) عادەت گرتو، فێر بوُگ: (لە چەنەبازیدا **لۆس** بوە)؛ ۶) برێتی لە تەواو لە کارکەوتن: (ئیتر **لۆس** بوُم ناتوانم کار بکەم)؛ ۷) فەتیر، نانی هەویرهەڵنەهاتگ ف ۱) لُپ از داخل؛ ۲) چوب زیر بار گران کە چند نفر بردارند؛ ۳) اَهرم؛ ۴) سابیدە از کار زیاد؛ ۵) عادت کردە، یاد گرفتە شدە؛ ۶) کنایە از کاملاً خستەشدن؛ ۷) نان فطیر.
**لوُس:** ۱) ساف، بێ گیاو بێ موُ؛ ۲) حولی، بێ گرێو زبری؛ ۳) برێتی لە جوان: (ژنێکی **لوُسە**)؛ ۴) تەڕزوانی خوڕێكخەر: (بەسیە چیتر خۆ **لوُس** مەکە)؛ ۵) پلوسك؛ ۶) تاڤگە؛ ۷) قوُندەر؛ ۸) دەزگای ڕۆن لە ڕوەك گرتن؛ ۹) جێ هەڵنیشتنی مریشكو بوّقلە، لیس ف ۱) صاف بی موی و بی گیاە؛ ۲) صاف بدون گرە و زبری؛ ۳) کنایە از زیباروی؛ ۴) چرب‌زبان؛ ۵) ناودان؛ ۶) آبشار؛ ۷) کونی؛ ۸) دستگاە روغن کشی؛ ۹) جای روی تخم نشستن مرغ و بوقلمون.
**لوُساو:** ۱) سوُل، پلوسك؛ ۲) سولاف، تاڤگە ف ۱) ناودان؛ ۲) آبشار.
**لوُساوك:** لوُساو ف نگا: لوُساو.
**لۆسبوُن:** ۱) سوان لەبەر کاری زۆر؛ ۲) عادەت گرتن بە شتێ؛ ۳) لەکارکەوتن لەبەر ماندگی ف ۱) سابیدەشدن؛ ۲) عادت کردن؛ ۳) ازکار افتادن ازفرط خستگی.
**لوُسبوُن:** لە زبری ڕزگاربوُن ف از زبری رهاشدن، صاف شدن.
**لۆستك:** چڵپاو، قوڕی شلو تراو ف لای و لجن.
**لوُسکار:** کەسێ کە شتی زبر ساف دەکا ف صافکار.
**لوُسکاری:** کاری لوُسکار ف صافکاری.
**لوُسکردن:** ساف کردن ف صاف کردن.
**لوُسکە:** ۱) فەرمان بە لوُسکردن؛ ۲) لاوی دەمڕوُت؛ ۳) برێتی لە لاوی حیز ف ۱) صاف کُن!، امر بە صاف کردن؛ ۲) جوان بی‌مو؛ ۳) کنایە از بچەکونی.
**لوُسکەباز:** بەچەباز ف بچەباز.
**لوُسکەبازی:** بەچەبازی ف بچەبازی.
**لوُس‌لوُسك:** جۆرێ مارمێلکەی درێژ، شین‌شینك، زەردەقوڕە ف آفتاب‌پرست.
**لوُس‌وپوُس:** تەواولوُس، بێ هیچ زبری ف کاملاً صاف بدون زبری.
**لۆسۆرە:** گەنەلۆ، گیایەکە لەتیرەی گەڵادەرزی ئاژەڵ کوێر دەکا ف گیاهی است برگ سوزنی و سمّی.
**لۆسە:** باری، لۆس ف اَهرم.
**لۆسەکە:** گیایەکە بنکی دەخورێ ف گیاهی است با پیازهٔ خوردنی.
**لۆسی:** ۱) ساویاگی؛ ۲) ماندویەتی زۆر ف ۱) سابیدگی؛ ۲) خستگی زیاد.
**لوُسی:** ۱) دژی زبری، سافی؛ ۲) تەڕزوانی ف ۱) صافی؛ ۲) چرب زبانی.
**لۆش:** ۱) گیایەکی بۆن‌خۆشە؛ ۲) نانی فەتیر ف ۱) گیاهی است خوشبو، ۲) نان فطیر.
**لوُش:** ۱) هەڵمژینو قوُتدان: (هەژدیها هەڵی **لوُشی**)؛ ۲) دەنگی لوُتی چڵمن: (چڵمی ناسترێ هەر **لوُشەلوُشیەتی**)؛ ۳) دەنگی دەمو لوُتی یەکسم لە تاسەی جۆ ف ۱) برکشیدن و بلعیدن؛ ۲) صدای بینی خلمی؛ ۳) صدای بینی چارپا درآرزوی علیق.
**لوُشان:** قوُتدرانی بە خڕی ف دُرُستە بلع شدن.
**لوُشاندن:** ۱) قوُتدانی بە خڕی؛ ۲) پڕمەو بۆڵەی یەکسم بۆ ئالیك ف ۱) دُرُستەبلعیدن؛ ۲) لندیدن چارپا برای علیق.
**لوشاو:** لافاو، لەهی ف سیلاب.
**لۆشك:** جۆرێ کولێرەی چکۆڵە ف نوعی گردە نان کوچك.
**لوُشك:** جفتە، جوُتە، جۆحتك ف لگدپرانی چارپا.
**لۆشکە:** لۆچکە ف لباشن.
**لوُشکە:** ۱) لوُشك، جوُتە؛ ۲) پڕمەو بۆڵەی یەکسم بۆ ئالیك ف ۱) لگدپرانی؛ ۲) لندیدن چارپا برای علیق.
**لوشمە:** ۱) ناڵەو دەنگی نزم بە گریانەوە؛ ۲) لوُشەی چڵمن؛ ۳) دەنگو هەنیسكدانی کەرو ئێستر لە دیتنی شتێ کە پێی خۆشە ف ۱) نالە وصدای خفیف همراە گریە؛ ۲) برکشیدن آب بینی؛ ۳) صدای اظهار تشکّر چارپا.

**لۆشمە:** گیایەکە ف گیاهی است.

**لۆشە:** کولێرەی گەورە ف گرده نان بزرگ.

**لوُشە:** ١) قوُتدانی بەساغی؛ ٢) گیایەکی دەناو دۆکلیوی دەکەن؛ ٣) جۆرێ نەخۆشی یەکسمو زەشەولاغ ف ١) درسته بلعیدن؛ ٢) گیاهی است آشی؛ ٣) یکی از بیماریهای ستور و چارپایان.

**لوُشەلوُش:** لوُشەکردنی زۆری یەکسم ف لندیدن پیاپی ستور.

**لوُشی:** هێشو ف خوشه.

**لوُشین:** ١) قوُتدان بە ساغی؛ ٢) لوُشەکردنی یەکسم ف ١) درستەبلعیدن؛ ٢) لندیدن ستور.

**لوعاب:** لینجاو: (بامیە لوعابی هەیە) ف لعاب، لزجاب.

**لۆغ:** ١) لۆچ، توێ؛ ٢) بانگلێر، بانگوش ف ١) لایه، چین؛ ٢) بام غلتان.

**لۆغان:** بەزمو ئاهەنگ ف بزم و سرور.

**لۆغانە:** بەخشش بە هۆی خەرمانسوُربوُن ف انعام به شادی خرمن آمادەشدن.

**لوغم:** ١) ڕێگە بەبن عەرزدا؛ ٢) تەقەمەنی کە دەبن گڵ دەخرێ ف ١) نقب؛ ٢) مین.

**لۆغە:** ١) نەخۆشی زمانئەستوُربوُن؛ ٢) لۆغانە ف ١) بیماری ورم زبان؛ ٢) نگا: لۆغانە.

**لۆغەت:** شاتو شوُتی لە ڕاستی بەدوُر، شایعە: (باوەڕ مەکە هەمو **لۆغەتە**) ف شایعه.

**لۆغەلۆغە:** لۆغە ف بیماری ورم زبان.

**لوف:** دۆی کولاو بۆ کەشك و ژاژی ف دوغ جوشیده، کشك.

**لۆق:** ١) لاق، لنگ: (ئەم کابرا **لۆق**درێژە کێ بو؟)؛ ٢) گاف؛ ٣) لە ئەژنۆ بەرەژێر؛ ٤) هێلکەی گەنیو؛ ٥) قۆرتە، قەترە؛ ٦) قنەی باڵدار؛ ٧) ناقایم: (کورسیەکەم لەق و **لۆقە**)؛ ٨) بە دەگمەن، دەگەڵ تاق دەگوترێ: (تاق و **لۆق**)؛ ٩) نائاسایی؛ ١٠) تۆلاّ، قورسە؛ ١١) کولێرە؛ ١٢) لەقە بە پا ف ١) لنگ؛ ٢) گام؛ ٣) از زانو به پایین؛ ٤) تخم‌مرغ گندیده؛ ٥) هَروَله؛ ٦) راه‌رفتن پرنده؛ ٧) سُست، نامحکم؛ ٨) کم و بەندرت؛ ٩) غیرعادّی؛ ١٠) قرص؛ ١١) نان گرده؛ ١٢) لگد.

**لۆقاندن:** بە قۆرتە ڕۆیشتن ف هَروَله کردن.

**لۆقانن:** لۆقاندن ف هَروَلەکردن.

**لۆقاو:** گاف ف گام.

**لۆقژی:** لەپڕ دەرپەڕی، خۆی هاویشت ف ناگهان بیرون جهید.

**لۆقژین:** دەرپەڕینی لەپڕ ف بیرون جهیدن ناگهانی.

**لۆقلۆق:** ١) بێ‌ئاوەزو نازیرەك؛ ٢) تەپ.بۆ یەکسمی ئێژن ف ١) کودَن؛ ٢) حیوان باربر تنبل.

**لۆقلۆقی:** ١) لنگدرێژ؛ ٢) گاف گوشاد ف ١) لنگ دراز؛ ٢) گام فراخ.

**لوقمان:** بژیشکی زۆر زانا: (دەردی من بە حەکیمو **لوقمانان** چاری نایە) ف طبیب دانشمند.

**لوقمە:** ١) پارو؛ ٢) دەم‌بەست؛ ٣) نەخۆشی گرفت؛ ٤) قایشێ کە ئاوزەنگی تێدایە ف ١) لقمه؛ ٢) پوزەبند؛ ٣) بیماری اِمتلا؛ ٤) نواری که رکاب در آن است.

**لوقمەڕفێن:** چاوچنۆکی چڵێس ف آزمند خوراك و بی‌شرم.

**لوقمەفرێن:** لوقمەڕفێن ف نگا: لوقمەڕفێن.

**لوقمەقازی:** جۆرێ شیرنی‌یە ف نوعی شیرینی.

**لوقمەکراو:** دەم‌بەستراو ف پوزه بسته.

**لوقمەکردن:** توُشی نەخۆشی گرفت بوُن ف به بیماری امتلا دچارشدن.

**لوقمەگرتن:** پاروی زل لەدەم‌نان ف لقمهٔ بزرگ بلعیدن.

**لۆقن:** لنگدرێژ ف لنگ دراز.

**لۆقە:** ١) قۆرتە، قوُترە، قەترە، گورگەلۆقە؛ ٢) جارو بار، بەدەگمەن: (تاق و **لۆقە**) ف ١) هَروَله؛ ٢) بەندرت.

**لۆقەکردن:** بەقۆرتەڕۆیشتن ف هَروَله کردن.

**لۆقەلۆق:** بەقۆرتەڕۆیشتن ف هَروَله رفتن، نِم دورفتن.

**لۆق‌هاویشتن:** گافی درێژ ڕۆیشتن، بازدان، شەقاوهاویشتن ف گام فراخ برداشتن.

**لۆق‌هەڵێنان:** شەقاونان ف گام برداشتن.

**لۆق‌هەڵێنانەوە:** شەقاوهاویشتن ف گام برداشتن.

**لۆقین:** بەپەلەڕۆیشتن ف باشتاب رفتن.

**لوك:** لوُ، لك، گرێ‌گۆشت ف غدّه.

**لۆك:** ١)جسنێکی حوشتر؛ ٢) حوشتری نێر؛ ٣) برێتی لە ئازاو نەترس؛ ٤) ڕێك‌گوشین و گلۆفین؛ ٥) داخران و مۆرکران؛ ٦) تۆلاّ، قورسە؛ ٧) قەترە، تکە؛ ٨) پەمبی، پەمۆ ف ١) نژادی از شتر؛ ٢) شتر نر؛ ٣) کنایه از شجاع؛ ٤) فشردن در آغوش؛ ٥) لاك و مهر؛ ٦) شمش؛ ٧) قطره؛ ٨) پنبه.

**لۆك:** پاشگرێکە بۆ زیادگوتن: (سست و کەفە**لۆکە**) ف پسوند مبالغه.

**لوُك:** لۆك ف پسوند مبالغه.

**لۆکاندن:** ١) گمەکردن و یەکترتلاندنەوە؛ ٢) برێتی لە لاقەکردن ف ١) دستبازی و یکدیگر را غلتانیدن؛ ٢) کنایه از همخوابه‌شدن.

**لۆکچە:** وشتری نێری سێ‌بەهاردیتە ف بچّه شتر نر سه‌ساله.

**لوکژین:** ١) لەوەڕی ئاخەلێوە؛ ٢) پروشەی ئاژڵ دوای نەخۆشی ف ١) چرا از گیاه تازه برآمده؛ ٢) اندك اندك چریدن حیوان تازه‌شفا یافته.

**لۆك‌کردن:** داخستن و مۆرکردن ف لاك و مهرکردن.

**لۆکە:** ١) پەمۆ، پەمبی؛ ٢) پاشگری چوُك‌شاندان ف ١) پنبه؛ ٢) پسوند تصغیر.

**لۆکە:** لوُکە ف پسوند تصغیر.

**لوُکە:** پاشگری چوُك‌شاندان: (سێوە**لوُکە**، دیوە**لوُکە**) ف پسوند تصغیر.

**لۆکی:** ڕەنگی سوُری گەش لە قالیدا ف رنگ قرمز در قالی، لاکی.

**لۆکێ:** بۆ کام‌کەس؟ ف برای چه‌کسی؟

**لۆگەنە:** لوسوُرە ف نگا: لوسوُرە.

**لوُگی:** بەرهەڵدای بێکارە ف ولگرد.

**لوُل:** ١) بادراو، لوُر؛ ٢) لوُربوُنی باڵدار؛ ٣) سەرخۆش؛ ٤) پەیوەند لە دار ف ١) تاب داده؛ ٢) شیرجهٔ پرنده؛ ٣) مست؛ ٤) پیوند درختی.

**لولا**: هەرشتی درێژی ناوبەتاڵ ف لوله.

**لوُلاق**: پێشەی بەلەك، گاللوٚر ف استخوان ساق.

**لوُلاك**: لوُلاق، گاللوٚر ف استخوان ساق.

**لوٚلان**: گوندێکە لە کوردستان ف نام دهی است.

**لوُلان**: ۱) پیچ‌خواردن؛ ۲) پێچدان ف ۱) پیچ‌خوردن؛ ۲) پیچ‌دادن، پیچاندن.

**لوُلـدان**: ۱) پێچ‌دان، پێچـانـەوە؛ ۲) بریتی لە بەپـەلـەخـواردن ف ۱) نوَردیدن؛ ۲) کنایه از با شتاب خوردن.

**لولسه**: شێتۆکە ف خُل.

**لوُلـك**: ۱) بلوێر؛ ۲) نامـرازێکی جوٚلاٚیی؛ ۳) دەمی درێژی مسینە؛ ۴) قرٚقرٚە، غەرٚغەرٚە؛ ۵) ژاڵە، لوُرٚك ف ۱) نی‌لبك؛ ۲) ابزاری در دستگاه بافندگی؛ ۳) لوله آفتابه؛ ۴) قرقره؛ ۵) خرزهره.

**لوُلکژەن**: بلوێرژەن ف نوازندۀ نی.

**لوُلکه**: لوُلکی جوٚلاٚیی ف «لوُلك» بافندگی.

**لوٚلکه**: ۱) لوُلکە؛ ۲) وشکەڵوا کە بوٚ سەفەر لێ‌دەنرێ ف ۱) نگا: لوُلکه؛ ۲) از غذاهای توشه‌ای.

**لوٚلکەسپی**: وشکەهەڵوای لە ئاردو شەکر ف نوعی حلوا از آرد و شکر.

**لوٚلکەسوٚر**: وشکەهەڵوای لە ئاردو دوشاو ف نوعی حلوا از آرد و شیرۀ انگور.

**لولو**: ۱) گەوهەرێکە لە ناو سەدەف لە دەریا دەس دەکەوێ، مرواری؛ ۲) گولێکە؛ ۳) لوٚلکەی جوٚلاٚ ف ۱) مروارید؛ ۲) گُلی است؛ ۳) نگا: لوُلکه.

**لوٚلوٚ**: ۱) سەرەتای لاوکە واتا: ئەی لاو ئەی جوان؛ ۲) چین لەسەرچین، توێ‌لەسەرتوێ؛ ۳) گیایەکی بوٚن‌خوٚشە، هەلاٚلە ف ۱) سرآغاز بعضی ترانه‌ها؛ ۲) چین برچین؛ ۳) گیاهی است خوشبو.

**لوٚله**: روٚڵەبەزمانی‌زاروٚکان ف فرزند در گویش کودکان.

**لوُلـه**: ۱) هەمـودرێژێکـی گروٚڤـەری‌ناوخـاڵـی؛ ۲) بلوێر؛ ۳) بێچـوی‌ورچ‌وبەراز؛ ۴) پێچراو، بادراو؛ ۵) خشلێکەبوٚدوعاتێخستن؛ ۶) نەخوٚشیەکی‌گوانی‌ئاژەڵ ف ۱) لوله؛ ۲) نی‌لبك؛ ۳) بچۀ خرس و خوك؛ ۴) نوَردیده؛ ۵) زیوری است؛ ۶) نوعی بیماری پستان دام.

**لوُلەبەند**: خشڵی لوُلەکەدوعای‌تێ‌دەخەن ف زیوری است.

**لوٚلەپ**: لوٚرەلەپ ف نگا: لوٚرەلەپ.

**لوٚلـەپە**: ۱) لوٚرەلەپ؛ ۲) چەرخی‌ئاوکێشان ف ۱) نگا: لوٚرەلەپ؛ ۲) چرخ آبکشی.

**لوُلەدار**: ۱) هەر دەفرێ لوُلەی هەبێ؛ ۲) حەیوانێ کە نەخوٚشی لوُلەی گرتوە ف ۱)آنچه لوله‌دارد؛ ۲) دامی که بیماری پستان دارد.

**لوُلەژەن**: لوُلکژەن، بلوێرژەن ف نوازندۀ نی.

**لوُلەکردن**: ۱) دروست‌کردنی لوُلە؛ ۲) پێچانەوە ف ۱) ساختن لوله؛ ۲) نوَردیدن.

**لوُلەکی**: لە تەرحی لوُلە ف لوله‌مانند.

**لوُلەوزنجیر**: خشڵێکی سینەیە ف زیوری است.

**لوُلەینه**: ئافتاوەی سواڵەت ف آفتابۀ سفالی، لوله‌هنگ.

**لولێ**: لوُلەینە ف نگا: لوُلەینه.

**لوُلی**: پێچ‌ولوُلی موُی سەر ف موی فرفری، پیچ و تاب مو.

**لوُلیان**: لوُلبوُن، پێچ‌دران ف نوَرد.

**لوُلێنه**: لوُلەینە ف لوله‌هنگ.

**لوٚم**: ۱) سەرکوٚنە، سەرزەنشت؛ ۲) بوٚ من ف ۱) سرزنش؛ ۲) برای من.

**لومـانـا**: گونـدێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدۀ کردستان توسط بعثیان.

**لوٚمان**: ۱) سەرزەنشتان؛ ۲) بوٚ ئێمە ف ۱) سرزنشها؛ ۲) برای ما.

**لوٚمه**: ۱) لوٚم؛ ۲) لوٚمان ف ۱) سرزنش؛ ۲) نگا: لوٚمان.

**لوٚمەی**: سەرکوٚنە، لوٚمە ف سرزنش.

**لوُمەی**: لوٚمەی ف سرزنش.

**لوٚن**: ۱) جوٚر، تەرح: (**چلوٚن**، بەو **لوٚنەی** توٚ دەتـەوێ)؛ ۲) بوٚ ئێمە؛ ۳) ناوی گونـدێکـە لە کوردسـتـان ف ۱) طور؛ ۲) برای ما؛ ۳) از روستاهای کردستان.

**لونایش**: هەڵبەزین لەشوێنی خوٚ ف ورجهیدن.

**لوُنایش**: لونایش ف ورجهیدن.

**لوٚنگ**: ۱) فوٚتە؛ ۲) کەوڵی ڕایەخ ف ۱) لُنگ حمّام؛ ۲) پوستین زیرانداز.

**لوُنه**: لانەی باڵدار ف لانه.

**لوٚنه**: تا، تاڵ، داو: (بە دو **لوٚنە** بیدرو) ف تار، نخ.

**لوُنەواز**: لانەواز ف نگا: لانەواز.

**لوٚوٚك**: لوٚپك ف لوبیا.

**لووەجن**: ۱) دوُکەڵ‌کێش؛ ۲) بوغاری ف ۱) دودکش؛ ۲) بُخاری.

**لووەل**: ۱) هەویری لەبن ژیلەموٚ برژاو؛ ۲) کەلانە، جوٚرێ کولێرە ف ۱) خمیر در خاکستر پُخته؛ ۲) نوعی غذا.

**لووی**: ڕێوی، ڕواس ف روباه.

**لوُوی**: لووی ف روباه.

**لوهین**: ڕێگا لەژێر زەمینەوە ف نقب، راه زیرزمینی.

**لْوی**: ڕێوی، رواس ف روباه.

**لوٚی**: ۱) داوی، تاڵی؛ ۲) بوٚ ئەو ف ۱) تار نخ یا...؛ ۲) برای او.

**لْوێ**: لەئەوجێگەی‌دوُر، لەوێ ف در آنجا.

**لوێچ**: لاوێچ ف نگا: لاوێچ.

**لوێخەڕو**: ریخوٚڵە ف روده.

**لْوێدەری**: لەوێ، لەوجێگادورە ف در آنجا.

**لْوێره**: لەوێ، لەوێندەرێ ف درآنجا.

**لوێشك**: کولێرە ف گرده‌نان.

**لْوُیشك**: گیای لوُشە ف گیاهی است.

**لوینه**: ئاشەوان ف آسیابان.

**لوٚیه**: ۱) توێ، توێژ؛ ۲) لەبـەر ئەوە: (**لـوٚیە** هاتم بت‌بینم)؛ ۳) جوابی پرسیار، بوٚیە: (لوٚ وات کرد؟ **لوٚیە**) ف ۱) لایه؛ ۲) به این دلیل، برای این؛ ۳) جواب سؤال، همینطوری.

**لوُیه**: ڕێوی، ڕواس، چتیر ف روباه.

**لە:** ١) دەناو: (**لە** گیرفانتدا)؛ ٢) بە سەبەبی: (**لە** ماندویی‌و **لە** خەمان نازانم چی بکـەم)؛ ٣) بۆ دەسپێکـردن: (**لە**منەوە بۆ تۆ)؛ ٤) دەفری دەم‌و کات: (**لە** ساڵ‌و زەمانان)؛ ٥) بۆ خاتری: (**لە** چاوی تۆ نەو پێکە دەخۆمەوە)؛ ٦) پاشگری پچوك‌شاندان: (بیچکە**لە**، کاکە**لە**، برا**لە**)؛ ٧) دوورخستنـەوە: (دەرپێ **لە** پێکـە، پاتۆڵ **لە**پێکە، ماری ڕەش **لە**ناو مەکـە) «مەسەل»؛ ٨) نزیك‌کردنەوە: (کەوای **لە**بەردایە)؛ ٩) پاژێ لە گشتێ: (ئـەوەش **لە**خـۆمـانـە)؛ ١٠) وێنە، ڕەنگ، جۆر: (کوڕەکەت **لە**خـۆت دەچێ)؛ ١١) پەلە، لەز؛ ١٢) وشەی بانگ‌کردن ف ١) در، توی؛ ٢) بەعلّت؛ ٣) برای شروع، از؛ ٤) ظرف زمان؛ ٥) بەخاطر؛ ٦) پسوند تصغیر؛ ٧) دورکردن؛ ٨) نزدیکی؛ ٩) جزئی از کلّ؛ ١٠) شبیه؛ ١١) عجله؛ ١٢) حرف ندا.

**ڵە:** پاشگری پچوك‌شاندان: (**تۆ پەڵە، کۆ پەڵە**) ف پسوند تصغیر.

**لەئاودان:** وەناو ڕووبار کەوتن ف بە آب زدن.

**لهازە:** باری، لۆسە ف اَهرُم.

**لەب:** ١) دەزگای‌دوودەری‌زار، کەنـارەی‌زار؛ ٢) کەنـارەی‌هەرشتێ؛ ٣) بەری دەست، لەپ ف ١) لب؛ ٢) کنارە؛ ٣) کف دست.

**لەبا:** ١) جەم، لنك؛ ٢) بەبا، سەگی‌نێرخواز ف ١) درنزد؛ ٢) مادەسگ جفت‌خواه.

**لەبابەت:** دەربارەی ف دربارهٔ.

**لەبـات:** ١) لەجیات؛ ٢) ئەندامێك: (**لەباتا** خوێندانی بریندار بو)؛ ٣) جوڵان، بزوتن ف ١) بەجای؛ ٢) اندامی، عضوی؛ ٣) جُنبیدن.

**لەباتی:** لەبات، لەجیات ف بەجای.

**لەباتیان:** لەبات، لەجیات ف بەجای.

**لەباچونەوە:** دێلەسەگی واز لە گانخوازی هێناو ف مادەسگ لقاح گرفته.

**لەبادە:** کولەباڵ ف نیم‌تنهٔ نمدی.

**لەبار:** ڕێك‌و پێك ف مناسب و شایان.

**لەبارابون:** ١) لەناقەت‌دابون؛ ٢) ڕەوای کارێ ف ١) در توان بودن؛ ٢) شایستگی.

**لەباربونەوە:** برێتی لە بێچوبون، زان ف زاییدن.

**لەبارچون:** بێچو بەمردویی هاویشتن ف بچه‌انداختن.

**لەبارچونەوە:** نەزۆك‌بون دوای زگ‌کردن ف نازا شدن.

**لەبارە:** دەربارە ف دربارە.

**لەبالەب:** تژژە، پڕاوپڕ، دارماڵ ف پُر و لبالب.

**لەبـان:** ١) بـالاتر، بەرەژورتر؛ ٢) گیای حەسیرلێ‌چێ‌کردن؛ ٣) گزی، فێڵ، حیلە ف ١) بالای، بَر؛ ٢) گیاه حصیر؛ ٣) حیله، مَکر.

**لەبـاو:** ١) بەرەواج، برەودار؛ ٢) ئامـادەو گورج‌و گۆڵ ف ١) رایج؛ ٢) آماده و چالاك.

**لەباوەت:** لەبابەت ف دربارهٔ.

**ڵەبت:** جوڵە، بزوتن ف حرکت.

**ڵەبتاندن:** جوڵاندن، تەکان‌پێ‌دان ف حرکت دادن.

**ڵەبتۆك:** زۆر بەجوڵەو بزوتن ف بسیار متحرّك.

**ڵەبتی:** ١) بەجـوڵـە، بەبزوتن؛ ٢) بزوێنراو، جوڵەپێکراو ف ١) حرکت کننده؛ ٢) تکان داده‌شده.

**ڵەبتین:** بزوتن ف حرکت کردن.

**لەبڕ:** ١) بەقەبەڵ؛ ٢) گۆترە ف ١) کنتراتی؛ ٢) نگا: گۆترە.

**لەبڕبونەوە:** بێ‌تاقەت‌بون، لەقەوەت‌کەوتن ف بی‌تاب و توان شدن، از نیر وافتادن.

**لەبڕەبونەوە:** لەبڕبونەوە ف بی‌تاب و توان شدن.

**لەبری:** لەباتی، لەجیاتی ف بەعوض، بەجای.

**لەبڕی:** کاری بەقەبەڵ ف کنتراتی.

**لەبرێتی:** لەبری، لەباتی ف بەجای.

**لەبز:** ١) فەرمایشت، قسەی پیاوماقوڵ: (بابەغەڵیفە بە **لەبزی** ممبارەکی خۆی فەرمـوی)؛ ٢) لێو، لەب: (ئاخر تۆ بۆ **لەبزت** ناگەڕێ) ف ١) فرمایش؛ ٢) کنایە از لب.

**لەبزەڕینە:** نیسکێنەی توند کە ڕۆنی قاڵکراوی بەسەردا دەکەن ف آش عدس غلیظ کە روغن برآن ریزند.

**لەبزی:** بە قسەی ڕوبەڕو ف شفاهی.

**لەبزینە:** جۆرێ شیرنیاتە ف لوزینە، نوعی شیرینی.

**لەبك:** سەرلێ‌شێوان، هۆش‌بڵاوبون ف هَول شدن.

**لەبکاندن:** سەرلێ‌شێواندن ف هول کردنِ دیگری.

**لەبکۆك:** کەم هۆش، بیر بڵاو ف حواس پرت.

**لەبلەب:** جۆرێ کۆتر ف نوعی کبوتر.

**لەبلەبان:** دمهەراش‌و قسەزان ف فصیح و سخنور.

**لەبلەبی:** لو بلو بە ف لبلبی، نخودچی.

**لەبن:** ١) گش، گشت، تێکـڕا؛ ٢) لەڕەگەوە، لە ڕیشـە؛ ٣) قەت: (هەر **لەبن** نەم‌دیوە)؛ ٤) لەژێرەوە ف ١) همە؛ ٢) از بیخ؛ ٣) هرگز؛ ٤) از زیر.

**لەبن‌هاتو:** ١) قڕان‌تێکەوتو؛ ٢) بەڕیشەوە دەرهاتگ ف ١) دودمان بر باد رفته؛ ٢) ریشەکن شدە.

**لەبنەوە:** ١) لەخوارەوە، بەرانبەری لەسەرەوە؛ ٢) بە نهێنی، بەدزیەوە ف ١) از زیر؛ ٢) پنهانی، دزدکی.

**لەبنەهاتو:** ١) لەبن‌هاتو؛ ٢) تەواوبوگ: (کارت **لەبنەنایە**) ف ١) ازبین رفته، ریشەکن شدە؛ ٢) تمام شدە.

**لەبو:** لباد، تەحت، کولاف ف نَمد.

**لەبۆ:** ١) لبۆ، بۆ خاتری؛ ٢) بۆ چی؟، چما؟، لبۆ؟ ف ١) برای؛ ٢) کلمهٔ پرسش، چرا؟.

**لەبوچی:** کولاف‌کەر، نمەدماڵ ف نَمدمال.

**لەبە:** گۆشتی زۆرچەور ف گوشت بسیار چرب.

**لەبەر:** ١) داری بەمیوە؛ ٢) بۆ خاتری، بە سەبەبی؛ ٣) بێ کتێب زانین: (قورعانی **لەبەرە**) ف ١) درخت ثمردار؛ ٢) از برای؛ ٣) ازبر، از حفظ.

**لەبەربێزان:** قێز لێ هاتنەوە ف از چشم افتادن، حال از چیزی بهم خوردن.

**لەبەربێزران:** لەبەربێزان ف نگا: لەبەربێزان.

**لەبـەرچـاو:** ١) دیار، خویا، ئاشکـرا؛ ٢) لەبیرنـەکـراو: (چاکەی تۆم لەبەرچاوە) ف ١) آشکار؛ ٢) فراموش نشده.

**لەبەرچاوکەوتن:** قێزلێ‌هاتنەوە، لەبەربێزان ف از چشم افتادن.

**لەبەرچاوگرتن:** چاونۆڕی‌لێ‌کردن، چاوێری ف زیرنظر گرفتن.

**لەبەرچو:** ١) بێچوی بەمردوویی‌زاو؛ ٢) چیتر نازێ؛ ٣) چیتر بەرناهێنێ ف ١) بچهٔ مرده به دنیاآمده؛ ٢) نازا شد؛ ٣) از ثمر افتاد.

**لەبەرچوگ:** بێچوی بەمردوویی‌زاو ف افگانە، بچهٔ مرده بەدنیا آمده.

**لەبـەرچـوُن:** ١) بێچـوی مردوُ هێنـان؛ ٢) چیتـر بەرنـەدانی دار؛ ٣) تەواوبوُنی کار ف ١) بچەانداختن؛ ٢) ازثمرافتادن درخت؛ ٣) تمام شدن کار.

**لەبەرچوُنەوە:** ناهومێدبوُنی مێوینە لە زان ف یائسەشدن.

**لەبەرچی:** ١) چما؟، ئەڕا؟؛ ٢) توُکی‌ژنە لە ژن، واتا: زاروێت نەبێ ف ١) چرا؟، برای چه؟؛ ٢) نفرین زنانە، نازاشوی.

**لەبەرددان:** برێتی لە فەوتاندنی ماڵ ف کنایە از نابودکردن سرمایە.

**لەبـەرڕۆیشتن:** ١) لەبـەرچـوُنی کار؛ ٢) تراو لە شتێکـەوە دەرچوُن: (نـاوی **لەبەردەڕوا**، خوێنی **لەبەرڕۆیشت**) ف ١) بەنهایت رسیدن کار؛ ٢) مایع از چیزی جاری شدن.

**لەبەرڕۆین:** لەبەرڕۆیشتن ف نگا: لەبەرڕۆیشتن.

**لەبەرکردن:** ١) دەبەرکردن، پۆشین؛ ٢) داکەندن، فڕێدانی جلك؛ ٣) گرتنەدڵ و لەبیرنەکردن، فێربوُنی بێ‌نوسراو ف ١) پوشیدن؛ ٢) کندن لباس؛ ٣) ازبرکردن.

**لەبـەرەوە:** ١) لەڕۆژگاری پێشترەوە؛ ٢) لەپێشەوە، دژی لەدواوە ف ١) ازپیش، از قبل؛ ٢) از جلو.

**لەبەزچوُن:** تەزینی لاق لە ماندوُیی ف از حرکت افتادن یا از خستگی.

**لەبەن:** قامیش. چیت، چیتك ف نی.

**لەبەیش:** پاڕانەوە، لاڵانەوە ف لابەکردن.

**لەبێ:** بەڵێ: (گەزێ **لەبێ** لەکوێ بوی لەچۆمان) ف بلی.

**لەبیایش:** لەبەیش ف لابەکردن.

**لەبیخە:** شەڵتەی سەربرین ف ضماد.

**لەبیر:** دژی فەراموش کراو ف دریاد.

**لەبیربوُن:** فەراموش نەبوُن ف بەیاد بودن.

**لەبیرچوُن:** فەراموش بوُن ف فراموش شدن.

**لەبیرچوُنەوە:** زاندراو فەراموش کردن ف فراموش کردن.

**لەبیرکردن:** ژبیرکردن، فەراموش کردن ف فراموش کردن.

**لەبیرەوچوُن:** لەبیرچوُنەوە ف فراموش کردن.

**لەپ:** ١) بەری دەست؛ ٢) لیچی نەستـوُر؛ ٣) پەلـە، لەز ف ١) کف دست؛ ٢) لب کلفت؛ ٣) عجلە.

**لەپ:** ڕاژان بەحەواوە ف نوَسان افقی.

**لەپا:** بەعۆدە، لەسەر: (ئەم کارە **لەپای** من) ف برعهده.

**لەپاچە:** شتی بەخۆدادان بۆ خەوتن، سەرڕایەخ، پێخەف ف رانداز رختخواب.

**لەپارە:** ١) پارچەو لەتی بەقەد لەپی دەست؛ ٢) گوشمەی گوێزو توُ ف ١) قطعە بە اندازهٔ کف دست؛ ٢) توت و گردوی باهم کوبیدە.

**لەپاش:** دوای ف پس از.

**لەپاشا:** لەدوای ف سپس.

**لەپاشان:** لەپاشا ف سپس.

**لەپاشانا:** لەپاشا ف سپس.

**لەپاکەفتن:** قەوەت دەلاقدانەمان لە نەخۆشێ‌و لە ڕێ‌ڕۆیشتن ف ازپا افتادن.

**لەپاکەوتن:** لەپاکەفتن ف ازپا افتادن.

**لەپان:** پانیەی پێ ف پاشنهٔ پا.

**لەپان:** قوُت‌چوُن ف بلع.

**لەپاندن:** قوُت‌دان ف بلعیدن.

**لەپت:** ١) لەبت، جوُڵە، بزوتن؛ ٢) بەعەرزدا کەوتن ف ١) حرکت؛ ٢) برزمین افتادن.

**لەپتاندن:** ١) تەکان‌پێ‌دان، جوُڵاندن؛ ٢) بەزەوی‌دادان ف ١) حرکت دادن؛ ٢) برزمین زدن.

**لەپتر:** شێوێکە لە وردەساوارو گۆشت ف آشی است.

**لەپتین:** ١) بڵندبوُن‌و نزم‌بوُن لە جوُڵەکردندا؛ ٢) بزوتن، بزوتنەوە ف ١) جست وخیز؛ ٢) حرکت.

**لەپڕ:** گوزو گومەت ف یکهو، ناگهان.

**لەپڕا:** لەپڕ ف یکهو، ناگهان.

**لەپڕایەکی:** لەپڕ ف یکهو، ناگهان.

**لەپڕڕا:** لەپڕ ف یکهو، ناگهان.

**لەپڕێ:** لەپڕ ف ناگهان، یکهو.

**لەپژ:** ١) بێهۆشی، بوُرانەوە، دڵ‌بوُردنەوە؛ ٢) لەپڕ بەربوُنەوە ف ١) اغما، بیهوشی؛ ٢) ناگهانی افتادن.

**لەپـژین:** ١) دڵ‌بوُرانـەوە، بێهۆش‌بوُن؛ ٢) لەپڕ کەوتن ف ١) بیهوش شدن؛ ٢) افتادن ناگهانی.

**لەپك:** ١) دەسکێش کە لەبەر سەرما لە دەستی دەکەن؛ ٢) وێنەی پەنجە لە بەڕەدا ف ١) دستکش؛ ٢) نقش پنجە درگلیم.

**لەپك:** دەسکێش ف دستکش.

**لەپکـە:** ١) زاخی شین، موروُی شین کە دەرمـانی برینـانـە؛ ٢) گوێ‌ماسیلە ف ١) زاج کبود، کات کبود؛ ٢) گوشماهی.

**لەپ‌لەپ:** دەنگی وێك‌کەوتنی تیخ ف چکاچك.

**لەپماڵ:** دەست‌پێداهێنان‌و شێلان ف ماساژ.

**لەپو:** ئامیانی هەویرگەیاندن، هەویرترش ف خمیرمایە.

**لەپۆرت:** نانی هەنجیر ف لواشك انجیر.

**لەپۆل:** شەپلەلێدراو ف فلج، لمس.

**لەپ‌ولەوس:** دەم‌و فلج، دەم‌و لەوس ف لب و لوچە.

**لەپـە:** ١) نخـۆشەر، لەتکەنۆك؛ ٢) چێشتی دەسخۆر؛ ٣) سواغ‌دان بە دەست؛ ٤) پەلە، لەز؛ ٥) پڕاوپڕ، تژە؛ ٦) برێتی لە دوپشکی زەلام ف ١) لپهٔ نخود؛ ٢) نگا: دەسخۆر؛ ٣) اندودن با دست؛ ٤) شتاب؛ ٥)

پرلبالب؛ ۶) کنایه از کژدم بزرگ.

**لەپە:** لەپ، راژان بەحەواوە ف نَوسانِ افقی.

**لەپەتیر:** دەسخۆر ف نگا: دەسخۆر.

**لەپەر:** زیپکەی زۆر بەژان ف جوش سوزناك.

**لەپەکوتێ:** دەسکوتانی کوێرانە، دەستەکوتێ ف دست گرداندن کورکورانە.

**لەپەلەپ:** پەلەپەل ف باشتاب.

**لەپــەلــەپ:** ۱) راژانی بەحـەواوە؛ ۲) دەنگی تونـدو زۆر لەلـوتـەوە، فنگەفنگ ف ۱) نَوسان افقی؛ ۲) صدای فین فین بینی.

**لەپەوڕۆ:** دەمەوڕۆ ف دَمَر افتادن.

**لەپێخە:** شەلتەو نیوەنمەك ف ضماد.

**لەپێست‌چوُنەدەر:** بریتی لە توڕەبوُنی زۆر ف کنایه از بسیار خشمناك شدن.

**لەپێست‌چوُنەدەرەوە:** لەپێست‌چوُنەدەر ف کنایه از بسیار خشمناك شدن.

**لەپێست‌دەرچوُن:** لەپێست چوُنەدەر ف کنایه از بسیار خشمناك شدن.

**لەپێش:** ۱) بەرلە؛ ۲) بەڕێزو قەدر ف ۱) قبل از؛ ۲) محترم.

**لەپیك:** لەپك، دەسکێش. کە *لەبەر سەرما دەدەستی دەکەن* ف دستکش.

**لەپێك:** لەپیك، دەسکێش ف دستکش.

**لەپێکردن:** ۱) پۆشین؛ ۲) داکەندن ف ۱) پوشیدن؛ ۲) کندن لباس، از پادرآوردن.

**لەپێ کەوتن:** لەپاکەفتن: (**لەپێ کەوتوُ**مو نەفسم بۆ هەوا دەشنێ وەکو منداڵ/ لەبەر پیری سەرم خۆی ناگرێ من تازە پێ دەگرم) «مەحوی» ف ازپا افتادن.

**لەپین:** ۱) بەلاداهـاتن؛ ۲) پەلـەکردن؛ ۳) گورگەلۆقەکردن ف ۱) کج شدن؛ ۲) عجلەکردن؛ ۳) هرولەرفتن.

**لەت:** ۱) پارچـە، پاژ؛ ۲) کەڵەکەبەردی ناو زەوی؛ ۳) گوێچی داکراولە گەمەدا؛ ۴) جمك، ئاواڵدوانە ف ۱) پاره، قطعه؛ ۲) تودهٔ قلوەسنگ در زمین؛ ۳) شتالنگ ریخته در زمین؛ ۴) دوقلو.

**لەتار:** شەقار، لەت‌لەت ف پارەپارە.

**لەتام‌دەرچوُن:** لە ئەندازە بەدەر خراپی کار ف بدی بیش از اندازهٔ کار.

**لەتام‌دەرکردن:** کاری ناڕەوای زیاد لە ئەندازە کردن ف کار بدبیش از حدّ کردن.

**لەتـان:** ۱) خوستن لێ بڕان، تەواو بێ‌دەنگ‌بوُن؛ ۲) ئۆقرەگرتن ف ۱) بی‌صداشدن؛ ۲) آرام گرفتن.

**لەتـانـدن:** ۱) وست کردن؛ ۲) ئارام کردن ف ۱) بی سروصـدا کردن، ساکت کردن؛ ۲) آرام کردن.

**لەتـاو:** ۱) لەتاسەوتارەزوُ: (**لەتاو** تۆحەجمینم نەبو)؛ ۲) لەبەرئێش‌وژان: (**لـەتاو**دەردم‌خەوم‌نیە)؛ ۳) لەناچاری‌و زۆربۆهاتن: (**لەتاو**گەرما پاڵم بەئاگرەوەدا) ف ۱) از شوق؛ ۲) از درد؛ ۳) از ناچاری.

**لەتاوا:** لەتاو ف نگا: لەتاو.

**لەتاوان:** لەتاو ف نگا: لەتاو.

**لەتاوانا:** لەتاو ف نگا: لەتاو.

**لەت‌بوُن:** شکان، پارچەبوُن ف شکستن، قطعه‌شدن.

**لەتر:** ڕەت، تل‌دانی بەپێوە ف تلوخوردن.

**لەتربردن:** ڕەت‌بردن ف تلوخوردن.

**لەتردان:** ڕەت‌بردن، لەتر بردن ف تلوخوردن.

**لەتك:** لەت ف نیمه، قطعه.

**لەت‌کردن:** شکاندن، پاژپاژکردن ف شکستن، قطعه‌قطعه‌کردن.

**لەتکــە:** میوەی قاشکــراوی لەبــەر تاو ئیشکەوەکـراو بۆ زستـان: (**لەتکە**قەیسی، **لەتکە**هەرمێ) ف برگهٔ میوه.

**لەتکەچوُن:** دەنگ‌نەمان لە ماندوُیی بۆ زاروێ کە زۆر دەگری و توانی گریانی نامێنێ ف ازپا افتادن بچه به سبب گریه بسیار.

**لەتکەنۆك:** لەپە، نخۆشەر ف لپهٔ نخود.

**لەت‌لەت:** پارچەپارچە، پاژپاژ ف قطعه‌قطعه.

**لەتم:** زۆرکاری، ستەم، زوڵم، ناهەقی ف ظلم، جور.

**لەتوپەت:** شکاوی زۆر پارچەپارچە ف خردوخاك.

**لەت‌وکوت:** پارچەپارچە ف قطعه‌قطعه.

**لەتە:** ۱) لەت، پارچە، پاژێ لە شتێ؛ ۲) لە تۆ ف ۱) پاره، قطعه؛ ۲) از تو.

**لەتەجەرگ:** ۱) کوتێ لە کەزەب؛ ۲) بریتی لە خوێنی مەیو؛ ۳) بریتی لە فرزەند، ڕۆڵە ف ۱) پارهٔ جگر؛ ۲) کنایه از خون منعقد؛ ۳) کنایه از فرزند.

**لەتەچن:** پارسەکی نان‌چنەوە لە ماڵان ف گدای ریزه‌نان خواه.

**لەتەچنی:** پارسەکی، گەدایی ف گدایی.

**لەتەر:** پۆز، پەلەك: (بڕوانە ئەو لنگ‌و **لەتەرە**) ف ساق.

**لەتەرە:** ۱) لەتەر، پۆز؛ ۲) تەشی ف ۱) ساق؛ ۲) دوك نخ‌ریسی.

**لەتەرەبۆق:** زگ‌زلی قاچ‌باریك ف شکم گندهٔ ساق باریك.

**لەتەك:** دەگەڵ ف همراه.

**لەتەلەتە:** پارچەپارچە ف قطعه‌قطعه.

**لەج:** ۱) ناوی گوندێکە لە موکوریان؛ ۲) لاسار؛ ۳) کێشەوگێرە ف ۱) نام روستایی است؛ ۲) خیره‌سر؛ ۳) جاروجنجال.

**لەجـوُت‌چوُن:** لەپـڕ وێستـانی ئاسیاو لە عەیبێکەوە ف ناگهان از کار بازایستادن آسیاب.

**لەجوڵەکەوتن:** بێ‌حەرەکەت‌بوُن ف از حرکت بازماندن.

**لەجە:** ۱) لاساری؛ ۲) دەردی‌دڵ، گلەیی لە بەخت ف ۱) خیره‌سری؛ ۲) درددل.

**لەجەر:** لاواز، کز، داڵگۆشت، زەعیف ف لاغر.

**لەجەری:** نەخۆشی بناوبوێری وردەماڵە کە گەروُی دەپەنمێ ف نوعی بیماری دام.

**لەجێ:** ۱) بەجێ، ڕەوا؛ ۲) بێ دەرەنگ‌کردن، فەورەن؛ ۳) ناوی گوندێکە لە کوردستان، لەج ف ۱) بجا، روا؛ ۲) فوراً؛ ۳) نام دهی است.

**لەجیات:** لەبات ف بەجای، عوض .

**لەجیاتی:** لەباتی ف بەجای.

**لەجێ چوُن:** ترازان، بەندی ئەندام لەجێگەی خۆی لاچوُن، وەرگەڕان ف ازجا در رفتن بند اندام.

**لەجێگەچوُن:** لەجێ چوُن ف دررفتگی مفصل.

**لەجێگەدەرچوُن:** لەجێ چوُن ف دررفتگی مفصل.

**لەچ:** دەسماڵی سەری ژنان، سەرپۆشی ژنانە، لەچك ف لَچك.

**لەچاو:** لە بەرانبەر: (**لەچاو تۆ پاڵەوانم**) ف در مقابل.

**لەچاوچوُن:** لە ئێرەیی چاوپیسان توُشی بەلا بوُن ف چشم بدخوردن.

**لەچاوگیران:** بریتی لە پێ نەزانیو سپڵەیی ف کنایه از حق ناشناسی.

**لەچك:** ١) سەرپۆشی ژنانە؛ ٢) گۆشەی دەسماڵو بوخچە و...، لك ف ١) لچك؛ ٢) گوشهٔ دستمال و بقچه و....

**لەچك بەسەر:** بریتی لە ئافرەت ف کنایه از زن.

**لەچك بەسەرە:** لەچك بەسەر ف کنایه از زن.

**لەچكدار:** بریتی لە پیاوی بەناموسو غیرەت ف کنایه از مرد غیرتمند.

**لەچوُچوُن:** لاقوەرگەڕانی ولاخەبەرزە ف دررفتگی پای دام.

**لەچە:** ١) بۆ چی؟؛ ٢) دەربارەی چی؟ ف ١) برای چه؟؛ ٢) دربارهٔ چه؟.

**لەچەر:** ١) رژد، رەزیل، چكوُس؛ ٢) گیرو پەڵپ گر ف ١) خسیس؛ ٢) لجباز، بهانه‌گیر.

**لەچەك:** لەچك ف لچك.

**لەچەك كردن:** ١) دەمو لوُت بە دەسماڵ بەستن؛ ٢) چەك لێ ئەستاندن ف ١) نقاب به چهره‌زدن؛ ٢) خلع سلاح کردن.

**لەچیك:** لەچك ف لچك.

**لەحاست:** لە بەرانبەر، لەڕوی: (**لەحاست تۆ چاوم هەڵنایە**) ف دربرابر، در مقابل .

**لەحاند:** لەحاست ف در برابر.

**لەحد:** یەك شەممە ف یکشنبه.

**لەحزە:** تاوێکی کەم ف آن، لحظه.

**لەحەیف:** ١) لێفە؛ ٢) لەداخ ف ١) لحاف؛ ٢) از حسرت.

**لەحیم:** بەسەریەکالکانی کانزا بە قەلاییو ئاگر، جۆش ف لحیم، جوش.

**لەحیمچی:** کەسێ کە کانزا جۆش دەکاتەوە ف جوشکار.

**لەحیم کار:** لەحیمچی ف جوشکار.

**لەحێوەت:** لەسامو ترسەوە ف از ترس.

**لەحێوەتا:** لەحیوەت ف ازترس.

**لەخاف:** لەغاو، لغاو ف لگام.

**لەخاڤ:** لغاو ف لگام.

**لەخت:** ١) بەدەن، ئەندامانی لەش بە تێکڕایی، قالب؛ ٢) دانی باڵدار ف ١) تن، کالبد؛ ٢) دانهٔ پرنده.

**لەختولار:** شل ومل ف نرم اندام رعنا.

**لەخرتك چوُن:** لەجێ چوُنی جومگە ف ازجا در رفتن مچ.

**لەخرتكەچوُن:** لەخرتك چوُن ف ازجا دررفتن مچ.

**لەخرێن:** تاشت، هیچ نەخواردو لەپاش لەخەوهەستان ف ناشتا، صبحانه‌نخورده.

**لەخرێنی:** لەخرێن ف ناشتا.

**لەخش:** خشکە، لەسەر قنگ خزین ف جنبیدن، خزیدن بر زمین.

**لەخشان:** خشکە کردن بە زەویندا ف جنبیدن، بر زمین جابجا شدن.

**لەخشتەبراو:** فریودراو ف فریب خورده.

**لەخشتەبردن:** خەڵەتاندن، خاپاندن ف فریب دادن.

**لەخشە:** لەخش ف نگا: لەخش.

**لەخشین:** لەخشان ف نگا: لەخشان.

**لەخم:** تەقەمەنیێ کە دەخرێتە ژێر عەردەوە ف مین.

**لەخۆبوردن:** دەست لە ژیان بەردان بۆ مەبەستێ ف از خودگذشتن.

**لەخۆبوردو:** دەست لە ژیان هەڵگرتو ف ازخودگذشته.

**لەخۆبوردویی:** خۆ لەبیرچوُنەوە بۆ کارێ ف ازخود گذشتگی.

**لەخۆبوُنەوە:** ١) کار پێك هێنان بە تەواوی؛ ٢) لەهۆش چوُن، بوُرانەوە؛ ٣) شەرمکردن ف ١) ازکار فراغت یافتن؛ ٢) از هوش رفتن؛ ٣) شرمنده شدن.

**لەخۆچوُن:** لەهۆش چوُن، بوُرانەوە ف غش کردن، مدهوش شدن.

**لەخۆخەفتن:** ئاگاداری خۆکردن ف ازخود مواظبت کردن.

**لەخۆدەرچوُن:** بایی بوُن، بادی هەوابوُن ف مغرور شدن.

**لەخوڕا:** ١) بەبێ هیچ، بێ هیچ سەبەب: (**لەخوڕا بەگژمدا هات**)؛ ٢) هەڵبەستو درۆ: (**لەخوڕا ئەم قسەیەی کرد**) ف ١) بدون سبب؛ ٢) به دروغ، از خوددرآوردن.

**لەخۆڕاپەرمون:** خۆ بە شیاوی کارێ زانین ف شایستگی درخود دیدن.

**لەخۆڕادیتن:** لەخۆڕاپەرمون ف شایستگی درخود دیدن.

**لەخۆڕادین:** لەخۆڕاپەرمون ف شایستگی در خود دیدن.

**لەخۆڕیان:** ١) گوُ بەخۆداکردن؛ ٢) بریتی لە سەرنەکەوتن لە کارێ کە خەریك بوە ف ١) برخود ریدن؛ ٢) کنایه از موفّق نشدن در کار.

**لەخۆڕیاو:** خویڕی، خۆڕی ف بیکاره و هرزه.

**لەخورێن:** لەخرێن ف ناشتا.

**لەخۆڕین:** لەخۆڕیان ف نگا: لەخۆڕیان.

**لەخورێنی:** لەخرێنی ف ناشتا.

**لەخۆکردن:** ١) دڵ ئێشاندنو ڕەنجاندن؛ ٢) جل پۆشین؛ ٣) جل داکەندن ف ١) دل آزردن کسی؛ ٢) لباس پوشیدن؛ ٣) لباس کندن.

**لەخۆگرتن:** ١) لەسەر خۆ پێویست کردن؛ ٢) بڕیاردان بە خێرکردن ف ١) برخود لازم دانستن؛ ٢) نذر.

**لەخۆگۆڕان:** غلوُربوُن، بادی هەوابوُن، لەخۆدەرچوُن ف مغرور شدن.

**لەخۆگۆڕاو:** غلور، بادی هەوا، لەخۆدەرچوُگ ف مغرور.

**لەخۆگۆڕین:** شتێ زانینو خۆ بە نەزان نواندن ف خود را به کوچهٔ علی چپ زدن، تظاهر به بیخبری کردن.

**لەخۆمان:** پاژێك لە ئێمە: (**فلانکەسیش لەخۆمان بو**) ف جزئی از ما، خودمانی.

**لەخۆمانە:** پاژێکە لە ئێمە ف جزئی از ماست، از ماست.

**لەخۆن:** لەخۆمان ف نگا: لەخۆمان.

**لەخۆنە:** لەخۆمانە ف ازماست.

**لەخۆوە:** لەخوڕا ف نگا: لەخوڕا.

**لیس تیَ هاویشتن:** لیس تیَکوتان ف نگا: لیس تیَکوتان.

**لیَستن:** لستن ف لیسیدن.

**لیستنەوە:** لیسانەوە ف لیسیدن.

**لیسك:** ۱) کوَلەکەی تیشکی خوَر کە لە کولانەوە دیَتەژوُر؛ ۲) قەفەزەی دوکـــانی مریشـك‌فروَش ف ۱) ستـونی از شعـاع نور خورشید که اززوزنه به درون خانه تابد؛ ۲) قفسهٔ مرغ فروشی.

**لیَسك:** تیخی دەم‌کەوچی کەوچك‌تاشین ف کارد قاشق‌تراشی.

**لیسکـە:** ۱) ئامـرازی زبرلوُس‌کردن؛ ۲) زمان‌لوُس‌و خوَریَك‌خەر؛ ۳) لوُسکـە، دەمـرُوُت ف ۱)ابزار صاف کردن؛ ۲) چرب‌زبان؛ ۳) اَمرَد، نوجوان بی‌مو.

لیَسکە: ئامرازی داربیَ کوَلین ف ابزارکندن چوب.

**لیسوَکە:** سواپ، بەردی تەنك‌و لوُسی گویَ‌چەم ف نگا: سواپ.

**لیسە:** چاوپوَشی لە هەلە ف چشم‌پوشی از خطا.

**لیَسـە:** ۱) مالەی بەردین بوَ سواغ؛ ۲) خیَشك؛ ۳) مل‌وموَی ئاژەل بوَ شتی سویَر ف ۱) مالـهٔ سنگی، انداوه؛ ۲) مالهٔ شخم صاف‌کن؛ ۳) پوزه‌گرداندن حیوان برای نمك.

**لیسەخەرت:** لیسك، لیزگ ف نگا: لیزگ.

**لیَسەر:** لافاو، سیَلاو ف سیلاب.

**لیَستن:** لستنەوە ف لیسیدن.

**لیَش:** ۱) کوَمـەلیَ لە گیا کە بە باریَك هەلـدەگیریَ، گالیَش؛ ۲) تەوژم، لیَشاو؛ ۳) چلّك؛ ۴) ژەنگ ف ۱) یك بار ستور از علف؛ ۲) فشار؛ ۳) چرك؛ ۴) زنگ.

**لیشامە:** هەلاش، ئالاش، پوش‌و چرپی سەرخانو ف انبیره.

**لیَشـــاو:** ۱) ئاوی زوَر بەتـــەوژم؛ ۲) بریَتی لە زەحف، فرە: (نـان‌و ئاو لیَشاوە) ف آب زیاد با جریان شدید؛ ۲) کنایه از فراوانی.

**لیشتوَك:** تەماح کاری بیَ‌ویجدان‌و نەخلاق ف آزمند بی‌وجدان.

**لیَشریَ:** قازیاخە، گیادوَکلیویَکە ف گیاهی است آشی، قازیاغی.

**لیَشك:** لەیم‌ولیشە ف نگا: لەیم‌ولیشە.

**لیَشکن:** چلّکن، پیس‌و پوَخل، گەمار ف چرکین.

**لیَ شیَوان:** لیَ تیَکچوُن ف نگا: لیَ تیَکچوُن.

**لیغاب:** لغاو ف لگام.

**لیغیز:** لیچق، لچق ف لَزِج.

**لیف:** ۱) کیســەی زبـری گەوچنی سابـوُن‌تیَ‌خستن بوَ خوَشتن؛ ۲) خواستنی شت لە خەلّك ف ۱) لیف حمّام؛ ۲) خواستن از مردم.

**لیَف:** لاف، پیَخەفی ناوتیَخراو ف لحاف.

**لیفـانـدن:** بەرزبـوُنـەوە، بلّنـدبـوُن، بەخـوَداهاتن. بوَ *گیای ئیَژن* ف رشدکردن، بالنده‌شدن. *درمورد گیاهان گفته می‌شود.*

**لیفك:** لیف ف نگا: لیف.

**لیفْك:** لاف، لیَف ف لحاف.

**لیفکە:** لفکەی حەمام ف لیف حمّام.

**لیفـوَ:** گونـدیَکی کوردستـانـە بەعسی کاولی کرد ف نام روستـایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**لیفوَك:** خوازەلوَك، کەسیَ زوَر شت لە خەلّك دەخوازیَ ف گدامنش.

**لیَفوَکە:** لافی پچکوَلەو تەنك ف لحاف کوچك و نازك.

**لیفە:** ۱) لفکـەی حەمام؛ ۲) کەرکیـت ف ۱) لیـف حمّام؛ ۲) شانهٔ پودکوبی.

**لیَفە:** لاف، لیَفە ف لحاف.

**لیَفەدرو:** ۱) کەسیَ کە کاری لیَف‌دروُنە؛ ۲) تەبەنە، دەرزی درشت ف ۱) لحافدوز؛ ۲) سوزن درشت.

**لیَفەدوُر:** لیَفەدرو ف نگا: لیَفەدرو.

**لیڤ:** ۱) لەو، لیَو، لو، لەب؛ ۲) کەنارە، قەراغ؛ ۳) دەرفەت، کیَس؛ ۴) پڕ، تژی ف ۱) لب؛ ۲) کنارە، لبه؛ ۳) فرصت؛ ۴) پُر.

**لیَڤ:** ۱) لەو، لەب، لو، لیف: ۲) قەراغ ف ۱) لب: ۲) لبه.

**لیڤا:** بەرخی تازەزاو ف برهٔ نوزاد.

**لیَڤ‌ریَژ:** پڕاوپڕ، گەلەکی تژی ف لبریز.

**لیَڤ‌شوَر:** بریَتی لە روَگرژ ف کنایه از اخمو.

**لیَڤك:** کەنار، قەراغ، لیَوار ف کنارە، کرانه.

**لیَڤکی:** راسپیَری بەبیَ‌نوسین ف پیام شفاهی.

**لیڤ‌لیڤك:** سەرلیوارە، قەراخی زوَر نزیك ف لبهٔ نزدیك.

**لیڤ‌ولیڤ:** دارمالّ، زوَرپڕ، لیپاولیپ ف مالامال.

**لیڤە:** ۱) گیَژو حوَل؛ ۲) شیَت، دین ف ۱) گیج و هالو؛ ۲) دیوانه.

**لیَ ڤەدان:** دەلان، دەلاندن ف ترشح مایع از ظرف.

**لیَ ڤەخارن:** خواردنەوە ف نوشیدن.

**لیَ ڤەخوارن:** خواردنەوە ف نوشیدن.

**لیَ ڤەکرن:** لیَ کردنەوە، چنینی بەر لە دار ف چیدن میوه از درخت.

**لیَ ڤەگرتن:** دەخوَوەپیَچان ف دور خود پیچیدن.

**لیَ ڤەگەڕیان:** جوابەجەنگی، وەرام‌دانەوەی هەڕەشە ف پاسخِ تهدید.

**لیڤەن:** قامیشی باریك ف نی باریك.

**لیَ ڤەنیَڕین:** بوَگەڕان، تمـاشـاکـردن بوَ دوَزینەوەی گوم‌بوُگ ف ازپی چیزی گشتن.

**لیق:** ۱) لاق، لوَق، لنگ؛ ۲) ئاوی دەم ف ۱) پا، لنگ؛ ۲) آب دهن.

**لیَق:** ۱) ماستی ئامیان‌نەگرتووشل؛ ۲) گوَشتی لیچق‌و لەڕ؛ ۳) لاق ف ۱) ماست‌بند نیامدهٔ آبکی؛ ۲) گوشت لَزِجِ حیوان لاغر؛ ۳) پا، لنگ.

**لیقاو:** ئاوی دەم ف آب دهن.

**لیقن:** ۱) لچق، لیچق؛ ۲) تریَی پلّیخـــاوە؛ ۳) بنیادەمی لیق‌زوَر ف ۱) لزج؛ ۲) انگور لهیده؛ ۳) کسی که آب دهنش زیاد است.

**لیقوَ:** کەسیَ کە ئاو لە لالیَوی سەرەوژیَر دەبیَ ف کسی که آب دهنش از لوچه سرازیر است.

**لیَ قوَمیان:** توُشی بەلا بوُن ف بدبیاری.

**لیَ قوَمین:** لیَ قوَمیان ف بدبیاری.

**لیقە:** ۱) پرزەو پەڕوَی ناو دەوات؛ ۲) تریقەی پیَکەنین ف ۱)لیقهٔ دوات؛ ۲) صدای خنده.

**لیَقە:** لیقەی دەوات ف لیقه.

**لیقەلیق:** تریقەتریق ف هِرهِر خنده.

**لیٚ قەومان:** لیٚ قوٚمیان ف بدآوردن.

**لیٚ قەوماو:** توشی بەلاٚ هاتگ ف بدآورده.

**لیٚ قەومین:** لیٚ قەومان ف بدآوردن.

**لیك:** ۱) لیق، ئاوی دەم؛ ۲) قاشی میوه ف ۱) گلیز، لعابِ دهن؛ ۲) قاچ میوهٔ پالیزی.

**لیٚك:** ۱) ڕێك؛ ۲) لە یەکتر؛ ۳) تەواو ف ۱) هموار؛ ۲) از یکدیگر؛ ۳) تمام.

**لیٚك ئانین:** ڕێك خستن، لەڤ ئانین ف آشتی دادن دوضد.

**لیکاو:** لیقاو ف گلیز، لعاب دهن.

**لیٚك بوٚرین:** یەکتر عافوکردن ف همدیگر را بخشودن.

**لیٚك بوٚن:** ۱) شبی یەکتر بوٚن؛ ۲) لە ئێك و دو جیابوٚن ف ۱) شبیه هم بودن؛ ۲) از هم جداشدن.

**لیٚکبوٚنەوە:** ۱) شەق بردن، لەت بوٚن؛ ۲) دەست لیٚك بەردان لە شەڕدا ف ۱) شقه شدن، پاره شدن؛ ۲) جنگ را خاتمه دادن.

**لیٚك ترازان:** لـە یەك و دو بەربـوٚنی پیٚکەوەلکـاو ف ازهم جداشدن دوپیوسته.

**لیٚك خوڕین:** گەف لە یەکتر کردن ف همدیگر را تهدیدکردن.

**لیٚك خەفتـان:** بوٚ دەرفـەت گەڕان لە دژی یەکتر ف برضد همدیگر پی فرصت بودن.

**لیٚکدالیٚکدا:** لەسەر یەك و بیٚ پسانەوە ف پیوسته و مداوم، مُسلسل.

**لیٚکدان:** ۱) تیٚکەڵ کردن؛ ۲) لە ئێکتر پەیوەندکردن؛ ۳) قوتانی یەك و دو؛ ۴) گوٚڕینـەوەی سەربـەسـەر ف ۱) آمیختن و به هم زدن؛ ۲) به هم پیوندزدن؛ ۳) همدیگر را زدن؛ ۴) سر به سر عوض کردن.

**لیٚکدانەوە:** بەراوردکردن ف براوردکردن.

**لیٚکدراو:** ۱) تیٚکەڵ کراو؛ ۲) لە ئێکو دو پەیوەندکراو ف ۱) آمیخته؛ ۲) بههمدیگر پیوندزده.

**لیٚکران:** هاڕان، وردبوٚنی دەخڵ لە ئاش ف آردشدن غلّه.

**لیٚکردن:** ۱) جیاکردنەوە؛ ۲) بار لەسەر پشت دانان؛ ۳) سوٚربوٚن لەسەر بەربەرەکانی کردن، بە نەترسیەوە شەڕکردن؛ ۴) وردکردن لە ئاش ف ۱) جداکردن؛ ۲) بارگذاشتن بر پشت؛ ۳) راغب به مبارزه بودن، با شجاعت جنگیدن؛ ۴) آسیاب کردن غلّه.

**لیٚکـردنـەوە:** ۱) جیاکـردنەوە؛ ۲) چنینی میوه لە دارو بیستان ف ۱) جداکردن، کندن؛ ۲) چیدن میوهٔ درختی و پالیزی.

**لیٚکرن:** دەغڵ لە ئاسیاو یان بە دەستاڕ هاڕین ف آرد کردن غلّه.

**لیٚك ڕەوینـەوە:** ۱) سڵ لەیەکتـر کـردن؛ ۲) گوشـادبـوٚنـەوە ف ۱) از همدیگر رم کردن؛ ۲) گشادترشدن.

**لیٚك ڤەبوٚن:** لیٚك جیابوٚنەوە ف ازهم جداشدن.

**لیٚك ڤەگیٚڕان:** ۱) بانگی یەکتر کردن بوٚ میوانی؛ ۲) قسە کردنەیەك ف ۱) ازهم دعوت کردن؛ ۲) توافق بر موضوعی کردن.

**لیٚك کردن:** ۱) دوٚری خستنەنیٚوان دوکەسەوە؛ ۲) نیٚوان ناخوٚش کردنی دو کەس؛ ۳) وەك یەك چوٚن؛ ۴) بە ئیشتیاوە پیٚکـەوە شەڕکردن ف ۱) دوری انداختن میان دونفر؛ ۲) از هم رنجانیدن دونفر؛ ۳) تشابه؛ ۴) رغبت به مبارزه باهم داشتن.

**لیٚك کردنــەوە:** ۱) دەست پیٚ لەشــەڕبــەردان؛ ۲) کردنـەوە: (**کتیٚب لیٚك بکەوە**) ف ۱) وادار کردن به دست از جنگ کشیدن؛ ۲) بازکردن.

**لیٚك کەفتن:** لەش لەیەکتردان ف تنه بههم زدن.

**لیٚك کەوتن:** لیٚك کەفتن ف تنه بههم زدن.

**لیکن:** لیقوٚ، لیقن ف کسی که آب دهنش سرازیر است.

**لیٚکنان:** بەسەر یەکداهیٚنانی دو لوٚ: (**چاولیٚکنان، کتیٚب لیٚکنان**) ف برهم آوردن دولایه از چیزی.

**لیٚکوپیٚك بوٚن:** تیٚك چوٚن و تیٚکەڵ پیٚکەڵ بوٚن ف درهم برهم شدن.

**لیٚکولیٚك:** تەواو بەرانبەر ف مساوی.

**لیٚکوٚڵینەوە:** توٚژینەوە ف کنکاش.

**لیٚك وەرهاتن:** لە دەوری یەکتر کوٚبوٚن ف دور هم جمع شدن.

**لیکه:** شینکەی نورت و تیٚراو ف سبزهٔ شاداب.

**لیٚ کەتــن:** ۱) ویٚ کەوتــن؛ ۲) لیٚ هاتـن، پەڕینـی نیٚرلــەمـیٚ ف ۱) برخوردکردن؛ ۲) پریدن نر برماده.

**لیٚك هاتن:** ۱) بوٚ نزیکی یەکتــر شیان: (**مـەخمـەرو کوٚنـەدەوار لیٚك نەدەهات**) «هەژار»؛ ۲) پیٚك هاتن؛ ۳) سواری یەکتر بوٚنی دو حەیوانی نیٚر ف ۱) مناسب بودن دوچیز یا دورنگ باهم، بههم آمدن؛ ۲) سازش کردن؛ ۳) برهمدیگر پریدن دونر.

**لیٚکـەر:** ۱) ئاشیٚڕ، دەستـاڕگیٚڕ؛ ۲) بریٚتی لە کاری هەر بەگوتـە ف ۱) دستاس گردان؛ ۲) کنایه از گفتهٔ بی عمل.

**لیٚکـەفتـگ:** ۱) لە کار بەرکـەنارکراو؛ ۲) پەك کەوتە؛ ۳) دەوڵەمەندی نابوت بوٚگ ف ۱) معزول؛ ۲) از کارافتاده و زمینگیر؛ ۳) ورشکست شده.

**لیٚ کەفتن:** ۱) لە کار بەرکەناربوٚن؛ ۲) لە شتیٚ کەوتن؛ ۳) نابوت بوٚن ف ۱) معزول شدن؛ ۲) بەچیزی خوردن؛ ۳) ورشکست شدن.

**لیٚکەفته:** لیٚکەفتگ ف نگا: لیٚکەفتگ.

**لیٚ کەوتن:** لیٚ کەفتن ف نگا: لیٚ کەفتن.

**لیٚکەوتو:** لیٚکەفتگ ف نگا: لیٚکەفتگ.

**لیٚ گر:** ئیرادگر، عەیب دوٚزەرەوە ف ایرادگیر، عیبجو.

**لیٚ گرتن:** ۱) عەیب لە کەسیٚ گرتن، ئیراد: (**نـابیٚ لیٚم بگری نەمزانی، لیٚم مەگره**)؛ ۲) هەڵبژاردن ف ۱) ایراد؛ ۲) گلچین کردن.

**لیٚ گرتنـەوە:** ۱) کەم کردنـەوە لە: (**خەرجت زوٚرە لیٚی بگرەوە**)؛ ۲) لە نمـونەوە دروس کردن: (**بەردی تەرازو دەگرمەوە، ئەو گەزە بەرە لیٚی بگرەوە**)؛ ۳) نەخوٚشی لە کەسیٚکەوە پیٚوەنوٚسان ف ۱) کم کردن از؛ ۲) از روی نمونەساختن؛ ۳) سرایت بیماری از کسی به دیگری.

**لیٚ گریٚدان:** ۱) پەیوەنــدکــردن؛ ۲) تیٚ گرتن، ئاراستـەکـردن ف ۱) پیوندادن؛ ۲) توجیه کردن.

**لیٚ گوٚڕان:** ۱) بە سەهــو شتــیٚ بە شتـیٚکـی تر زانـین؛ ۲) بریٚتــی لە بەدبــەخت بوٚن و ڕیٚون کردن: (**خــوا لیٚی گوٚڕیوه**) ف ۱) عوضی

گرفتن؛ ۲) کنایه از بدبخت شدن.

**لێ گۆران:** رەخسان لە شتێ: (ئەم ئەمامە لەم دارە گۆراوە) [ف] تکوین یافتن از.

**لێ گەڕان:** ۱) دواکەوتن بۆ دۆزینەوە؛ ۲) دەست لێ هەڵگرتن [ف] ۱) دنبال گشتن و جستجو؛ ۲) دست برداشتن از.

**لێ گەڕیان:** لێ گەڕان [ف] نگا: لێ گەڕان.

**لێ گەڕین:** لێ گەڕان [ف] نگا: لێ گەڕان.

**لێ گێڕانەوە:** ۱) لێ گرتنەوە؛ ۲) بانگهێشتن کردن؛ ۳) راگوێزتنی قسە لە یەکێکەوە [ف] ۱) کم کردن از؛ ۲) دعوت به مهمانی؛ ۳) روایت کردن از کسی.

**لیل:** لوول، لور، پێچدراو [ف] تو‌ردیده، تاب داده شده.

**لێڵ:** ۱) قوڕاوی؛ ۲) تێکەڵ پێکەڵ [ف] ۱) گل آلود؛ ۲) درهم و برهم.

**لێڵ:** شلوێ [ف] کدر.

**لێلات:** دەشتی پان و کاکی بەکاکی [ف] جلگهٔ وسیع.

**لێلافك:** لاولاو [ف] لبلاب، پیچك.

**لێلاف:** شلێوە، بارینی بەفر و باران پێکەوە، دودانگ بارین [ف] بارش برف و باران باهم.

**لیلان:** ۱) لێلان؛ ۲) دەنگی باکوت، هاشەو هارەی با بە بەفرەوە؛ ۳) گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد [ف] ۱) لرزاندن صدا در آوازخوانی؛ ۲) صدای کولاك؛ ۳) نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**لێلان:** بالۆرە، لێرین، لەرزانەوەی دەنگ لە خوێندنی قامدا [ف] لرزاندن صدا هنگام خواندن.

**لێلاو:** ۱) ئاوی شلوێ؛ ۲) بریتی لە کوێر بوون: (لێلاوم دایە بۆ ئەو پیاوە گەورە) [ف] ۱) آب کدر؛ ۲) کنایه از کورشدن.

**لێلاوی:** تاریك بوونی چاو [ف] بی سو یی چشم.

**لێلاوی داهاتن:** کوێر بوون [ف] کورشدن.

**لێلایی:** ۱) ناسافی؛ ۲) تەمی بەرچاو [ف] ۱) کدر؛ ۲) بی نوری چشم.

**لێلایی داهاتن:** کوێر بوون [ف] کورشدن.

**لیلق:** ۱) گۆشتی لواوی و ڕەگاوی؛ ۲) لیچق [ف] ۱) گوشت پرغدّه و رگ؛ ۲) لزج.

**لیلك:** ۱) کۆرپەساوای شل و ول؛ ۲) جۆرێ قامیش کە بۆ قەڵەم دەبێ؛ ۳) خم، هەش [ف] ۱) نوزادسست و بی نیرو؛ ۲) نوعی نی مخصوص قلم؛ ۳) نگا: خم.

**لێڵ کردن:** ۱) شلوێ کردنی ئاو؛ ۲) پاکردنی تێکوڵە گوێزی سەوز [ف] ۱) گلالودکردن؛ ۲) کندن پوست سبز گردو.

**لیلو:** لولو، مرواری [ف] مروارید.

**لیلوپەڕ:** لولوپەڕ [ف] نیلوفر.

**لیلوفەڕ:** لولوپەڕ [ف] نیلوفر.

**لیلە:** ۱) لوولە؛ ۲) لەلەی زاڕۆکان [ف] ۱) لوله؛ ۲) لله.

**لێڵە:** ۱) شەوەکی، بوولێڵە؛ ۲) زبڵ و زاڵی ناو پلوورە؛ ۳) قوڕاوێ کە بەسەر سەوزی دادەکرێ بۆ بەقەوەت بوونی [ف] ۱) فجر کاذب؛ ۲) آشغال کندوی عسل؛ ۳) آب گلالودی که بر سبزی پاشند.

**لیلەکین:** گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد [ف] از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**لیلەنگ:** خم، هەش، چویت [ف] نیل.

**لیلی:** لوولە [ف] لوله.

**لێ لێ:** خەریك، پاپا [ف] مشغول.

**لێڵی:** ناڕۆشنی، ناسافیەتی [ف] کدری.

**لیلیانــدن:** ۱) زۆر کەیف پێ هاتن؛ ۲) خۆش ویستن [ف] ۱) از چیزی خوشحال شدن؛ ۲) دوست داشتن.

**لیلی لی:** هەلهەلە، دەنگ و هەرای زۆر [ف] ولوله.

**لیم:** ۱) رەمڵ، رەڵم؛ ۲) کێم، چڵکی برین؛ ۳) چڵك، قرێژ [ف] ۱) ماسه؛ ۲) چرك زخم؛ ۳) چرك و کثافت.

**لێم:** ۱) لیتە، قوڕی زۆر شل؛ ۲) لە من [ف] ۱) لجن؛ ۲) ازمن.

**لیمــان:** خەستێکی زەردە کە دەگەڵ پیسایی دادەنرێ [ف] مایع غلیظ زردرنگی که با مدفوع آید.

**لێمان:** لەئێمە [ف] ازما.

**لیمتۆر:** دەم و لەوس [ف] لب و لوچه.

**لێمشت:** لافاو [ف] سیلاب.

**لێمن:** چڵکن، گەمار [ف] چرکین.

**لیمۆ:** میوەیەکی زەردە لە تیرەی نارنج و پرتەقاڵ، ترش و شیرنی هەیە [ف] لیمو.

**لیمۆیی:** بە ڕەنگی لیمۆ [ف] رنگ لیمویی.

**لیمە:** پاژ، پارچە، لەتك. زۆرتر بۆ گۆشت ئێژن [ف] پاره، جزء، قطعه.

**لین:** کوپەی گەورە [ف] خُم بزرگ.

**لێن:** لێمان، لە ئێمە [ف] ازما.

**لێن:** پاشگری بەواتا: جێگە: (خوێ لێن، قامیشەلێن) [ف] پسوند مکانی.

**لیناڤا:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بە عسی کاولیان کرد [ف] روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**لێنــان:** ۱) بارکردن؛ ۲) دروست کردنی چێشت؛ ۳) پێوە قایم کردن: (دەسکی لێ ناوە)؛ ۴) لەسەردانان: (مەلحەمی لێ نێ) [ف] ۱) بارکردن باربر؛ ۲) پختن غذا؛ ۳) پیوندزدن؛ ۴) بر سرگذاشتن.

**لینج:** لچق، لیچق [ف] لَزج.

**لینجاو:** لیچقاو، زنچکاو [ف] مایع لزج.

**لینجی:** لیچقی [ف] لَزجی.

**لینچق:** لینج [ف] لزج.

**لینچقاو:** لینجاو [ف] مایع لزج.

**لینچك:** لینج [ف] لزج.

**لینچکاو:** لنجاو [ف] مایع لزج.

**لیندو:** ۱) هەویرترش؛ ۲) ئەنگوتك؛ ۳) گرێ و قۆرت. بۆ شیر ئێژن [ف] ۱) خمیرمایه؛ ۲) چونهٔ خمیر؛ ۳) گره و لخته. در مورد شیر فاسد شده گویند.

**لینژ:** هێشوی دەنك لێ داڕندراو [ف] خوشهٔ لخت شده از دانه.

**لینسـان:** گونـدێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**لینك:** کوپەی گەورە، لین ف خمرهٔ بزرگ.

**لێ نوارِین:** لێ ڕوانین ف نگاه انداختن.

**لێ نۆڕین:** لێ ڕوانین ف نگاه انداختن.

**لێ نوُسین:** ۱) بە کاغـەز دەگەڵ یەکێ دوان؛ ۲) خەت بەسـەرداهێنان: (قاقەزی هێنا **لێم نوُسی**) ف ۱) نامه به کسی نوشتن؛ ۲) روی چیزی نوشتن.

**لینه:** لینك، لین، کوپەی زل ف خُمره.

**لێنەر:** پاشگری بەواتا: کەسێ کە لێنان کاریەتی ف پسوند فاعلی «لێنان».

**لێ نەڕین:** لێ ڕوانین ف نگاه انداختن.

**لێ نهێڕین:** لێ ڕوانین ف نگاه انداختن.

**لینی:** کەوی، حەمایەت، کەدی ف رام شده.

**لێ نێ:** فەرمان بە لێنان ف فرمان به «لێنان».

**لێ نیڕین:** لێ ڕوانین ف نگاه انداختن.

**لێ نیشتن:** ۱) دەست بەکـارێ کردن بەپـەلەو چالاکی، تێ شیشان؛ ۲) قنگەخزێ لە خلیسك؛ ۲) لە جوڵانەدا هاتوچۆکردن ف ۱) چابکانه و با شتاب سرگرم کاری شدن؛ ۲) نشسته سُرخوردن بر لیزگاه؛ ۳) تاب خوردن بر تاب.

**لیو:** لم، لیم، ڕەمڵ ف ماسه.

**لێو:** ۱) لەب، لەو، لو؛ ۲) کەنارە ف ۱) لب؛ ۲) لبه.

**لێوار:** کەنار، کەنارە ف لبه، کناره.

**لێوارە:** لێوار ف لبه.

**لیوان:** ۱) شەربەی شوُشە بۆ ئاوخواردنەوە؛ ۲) لغاو، لخاف ف ۱) لیوان؛ ۲) لگام.

**لێوان:** پڕ، سەرڕێژ ف مملوّ.

**لێوانلێو:** لیپاولیپ ف مالامال.

**لێوانە:** لێوان ف مملوّ.

**لێواولێو:** لێوانلێو ف مالامال.

**لێو بەبار:** خەمبار ف غمگین.

**لێودار:** بەلێوارە ف لبه‌دار.

**لێودان:** دەفـرێ کە بەسـانایی ئاوی لێ ڕۆکرێ: (ئەم قاپە **لێونادا**) ف ظرفی که آسان آب از آن سرازیر شود.

**لێ وردبـوُنەوە:** ۱)تواشاکردنی تەواو؛ ۲) بیرلێ کردنەوە ف ۱) با دقّت نگاه کردن؛ ۲) تأمّل و تفکّرکردن دربارهٔ چیزی.

**لێوژە:** گونـدێکی کوردستـانـە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**لێو کروژتن:** لێو کوروٚشتن ف نگا: لێو کوروٚشتن.

**لێو کوروٚشتن:** برێتی لە توُڕە بوُنی زۆر یان عەزرەت و ئاوات ف کنایه از خشم یا حسرت زیاد.

**لێو گەزتن:** لێو کوروٚشتن ف نگا: لێو کوروٚشتن.

**لیولی:** لولی، بلوێر، بلوُر ف نی لَبَك.

**لیوه:** شێت ف دیوانه.

**لێوه:** ۱) لیوه، دین، شێت؛ ۲) فێدار؛ ۳) فرۆ؛ ۴) ڕاچـڵەکـانـی دڵ، دڵ شڵەژان؛ ۵) شینکەی تازەڕواو کە بەر لیچی ماڵات دەکەفێ ف ۱) دیوانه؛ ۲) صـرعی؛ ۳) آغوزوشیر؛ ۴) یکه‌خـوردن؛ ۵) سبزهٔ تازه‌دمیده.

**لیودبوُن:** شێت بوُن ف دیوانه‌شدن.

**لێ وەبوُن:** لێ بوُنەوە ف نگا: لێ بوُنەوە.

**لێ وەخواردن:** خواردنەوە ف نوشیدن.

**لێ وەرگـرتـن:** ۱) سەنـن لە کەسێ کە شتێ ئەدا؛ ۲) برێتـی لە پەندقبوڵ کردن: (**لێم وەرگرە** پێت ئەڵێم)؛ ۳) تێوەپێچان ف ۱) گرفتن چیزی از کسی؛ ۲) کنـایه از انـدرزگرفتن؛ ۳) چیزی را به‌دور چیز دیگر پیچیدن.

**لێ وەرگەڕاندن:** برێتی لە وەرامدانەوە ف کنایه از پاسخ گفتن.

**لێ وەرهاتن:** کۆبوُنەوە لە دەوری کەسێ یا چتێ ف احاطه‌کردن.

**لێ وەستان:** ۱) بەرانبەر ڕاوەستان؛ ۲) پشوُدان بۆ بیرکردنەوە ف ۱) در مقابل ایستادن؛ ۲) وقفه برای تأمل کردن.

**لێ وەستانەوە:** بەرانبەر ڕاوەستان ف توقّف در مقابل.

**لێ وەشارتن:** تاقەت کردنی چتێ کە کەسێك نەیبینێ ف پنهان کردن.

**لێ وەشاردن:** لی وەشارتن ف قایم کردن.

**لێ وەشـانـەوە:** شیانی کارێك یا جلکێك بۆ کەسێ: (ئـەم کارە **لە تۆ ناوەشێتەوە**، ئەم جلکەی **لێ دەوەشێتەوە**) ف شایانی.

**لێ وەشاوە:** شایسە، شیاو ف شایسته، لایق.

**لێوەشۆ:** دەم کەندالێ کە ئاو لێی کەمدەکاتەوە ف کناره‌ای که آب آن را به تدریج بشوید.

**لێ وە گەڕاندن:** لێ وەرگەڕاندن ف کنایه از پاسخ گفتن.

**لێوەلەرزە:** لەرزینی زۆر لە سەرمان و لە ترسان ف لرزش شدید از سرما و ترس.

**لێوەلەرە:** لێوەلەرزە ف نگا: لێوەلەرزە.

**لێوەلەرێ:** لێوەلەرزە ف نگا: لێوەلەرزە.

**لێوەنگ:** مۆریانە ف موریانه.

**لێویان:** ۱) فێ گرتن؛ ۲) دڵڕاچەنین ف ۱) غش کردن از صرع؛ ۲) یکه‌خوردن.

**لێ هاتن:** ۱) سواربـوُنی فەحـل لە مێوینە؛ ۲) توُشی نەخۆشی سندان هاتنی حەیوان؛ ۳) شیاوی یەکتر بوُن: (ئەم کەوایەت جوان **لێ دێ**)، لێك هاتن ف ۱) ایغـری، سوارشـدن نر بر ماده؛ ۲) نوعی بیمـاری کشندهٔ چارپا؛ ۳) مناسب و شایان بودن.

**لێهاتگ:** ژێهاتی، لایق، لێهاتو ف شایسته.

**لێهاتو:** ژێهاتی ف شایسته.

**لێهاتی:** ژێهاتی ف شایسته.

**لێهاز:** لەوازە ف اهرم.

**لیهازە:** لەوازە ف اهرم.

**لیٚ هالاٚن:** بەدەورەداپیٚچان ف پیچیدن به دور چیزی.

**لیٚ هالاٚندن:** بەدەورەداپیٚچاندن ف پیچانیدن به دور چیزی.

**لیهان:** لاکان، لیان ف اسکی محلّی از ترکه.

**لیٚ هاندن:** ۱) رەتانـدن؛ ۲) هەڕەشەلیٚ کـردن ف ۱) خسته‌کردن؛ ۲) تهدیدکردن.

**لیٚ هلدان:** راستی لیٚ گوتن، نهیٚنی لەکەسیٚ ئاشکراکردن ف افشاکردن.

**لیٚ هەلاٚتن:** ۱) لەدەستڕاکردن؛ ۲) سواربوٗنی نیٚرلەمیٚو ف ۱) ازدست کسی یا چیزی فرارکردن؛ ۲) پریدن نر برمادینه.

**لیٚ هەڵسان:** لـەدەست‌هاتن: (ئەم‌کـاره لەو هەڵنـاسیٚ) ف ازدست برآمدن.

**لیٚ هەڵستان:** لیٚ هەڵسان ف ازدست برآمدن.

**لیٚی:** ۱) لباد، کولاو؛ ۲) لەئەو ف ۱) نمد؛ ۲) از او.

**لیٚ یش:** لیٚش، چلٚك ف جرك.

**لیٚی‌شن:** چلٚکن، گەمار ف چرکین.

**لیٚ یه:** لەهی، لافاو، لاپاو، سیٚلاو، لیٚ ف سیلاب.

**م:** ١) رانـاوی تەنیا بۆخـۆ: (نـەم خوارد، کردم)؛ ٢) راناوی پلەو پایە: (چارم، حەوتم)؛ ٣) من: (م گۆتە تە،ژ م ڕا) ف ١) ضمیر متّصل اوّل شخص مفرد؛ ٢) پسوند ترتیب؛ ٣) من.

**ما:** ١) نەڕۆیشت، لانــەچـو؛ ٢) نەمـرد، ژیا؛ ٣) گشت لە گشت نەبـو پاشـەرۆکی هەبـو؛٤) رەنگـە، رەنـگ‌هەیە: (**ما** ڕۆژەکی چێ بە)؛ ٥) ئاخـۆ؟، مەگەر؟: (**مـا** تە وە نەکرد؟)؛ ٦) تۆ بێژی؟، تۆ بڵێی؟: (**ما** وە دبێن)؛ ٧) بۆچی؟، لەبەر چی؟: (**ما** وەیە؟، **ما** ئەز بچم؟)؛ ٨)مێوینە: (**مـاکـەو، ماکـەر**)؛ ٩)رەگەز، بنچینە: (بنە**مای** باش نیە)؛ ١٠) زەرد، شاخی لوُس؛ ١١) شکێر، قەڵشەبەردی زل؛ ١٢) خۆگرتن‌و نزیك بە پێگـەیشتن: (دۆکڵیوەکە **مای** هێناوە)؛ ١٣) سەبەب، هۆ؛ ١٤)پرسی بەسەیرمانەوە ف ١)ماندگار شد؛ ٢) زیست؛ ٣) بقیەماند؛ ٤) امکان دارد؛ ٥)مگـر؟؛ ٦) آیا می‌شود؟؛ ٧)چـرا؟ برای چە؟؛٨) مادینە؛ ٩) اصل، اساس؛ ١٠)کوە سنگی؛ ١١) شکاف بزرگ در کوە؛ ١٢) قوام آمدن؛ ١٣) انگیزە؛ ١٤) لفظ پرسش با تعجّب.

**مابوُس:** بەندی، گراو، لەزیندان کراوف زندانی.

**مابــەین:** ١)دور، نێوان؛ ٢) ئاشنایەتی:(**مابەینمان خۆشە**)ف ١) میان؛ ٢) میانە.

**مابین:** مابەین ف نگاە: مابەین.

**مابێن:** مابەین ف نگا: مابەین.

**ماپوُس:** مابوُس، بەندی ف زندانی.

**ماپوسخانە:** گرتوخانە، بەندیخانە، زیندان ف زندان.

**ماپوُك:** چەپوك، بە لەپ لەسەردان ف توسری.

**مات:** ١) کز، کروشمە کردو؛ ٢) خەمگین؛ ٣) کوڵەکردو، دەرفەت‌خواز لە کارێ؛ ٤) کەلا بـەردی زلتر لە کەلای ئاسایی کە بۆ جۆرێ کەلایێن دەست ئەدا؛ ٥) قوڵکەی پچوُك بۆ کایەی کەلا بازی؛ ٦) سەرگەردان، سەرسوڕماو؛ ٧) وشەیەکە بۆ لەکارکەوتنی شای شەترنجی دەڵێن؛ ٨) دۆڕاو لە کایەی شەترنج‌دا؛ ٩) رەنگی بێ بریقە؛ ١٠) نەوی‌تر لە ڕیزی خۆی: (ئەو بەردانەی دە ڕێگەت گرتوە یەکیان **ماتە**)؛ ١١) بێ دەنگ: (لە گریانەکەی **مات** بوە)؛١٢) مانگ ف ١) کِز کردە؛ ٢) غمناك؛ ٣) منتظر فرصت؛ ٤) تیلۀ بزرگ؛ ٥) چالۀ کوچك تیلەبازی؛ ٦) متحیّر؛ ٧) اصـطلاح مات در شطرنج؛ ٨) بازندە در شطرنج؛ ٩) رنگ مات، نقطە مقابل برّاق؛ ١٠) کم ارتفاع‌تر در یك ردیف؛ ١١) ساکت؛ ١٢)ماە.

**ماتاب:** تاف‌هەیف ف مهتاب.

**ماتابان:** ١)مانگی لەعاسمان‌دیار؛ ٢) ناوە بۆ ژنان ف ١) ماە تابان؛ ٢) نام زنانە.

**ماتــاف:** بەرانبــەری خوڕ، ئاوێ کە بە مەندی‌و لەسەرخۆ دەڕوا ف آب سُست جریان.

**ماتان:** کایەی کەلا دەقوڵکەهاویشتن، چاڵان ف بازی تیلەبەگو.

**ماتانێ:** ماتان ف بازی تیلە بە گو.

**ماتاو:** ١) تاف‌هەیف؛ ٢) فیشەکەشێتە ف ١) مهتاب؛ ٢) آفتاب مهتاب آتشبازی، فشفشەبازی.

**ماتاوان:** ماتابان، ناوی ژنانە ف نام زنانە.

**مات‌بوُن:** ١) کز کردن؛ ٢) سەرگەردان‌بوُن ٣)بێدەنگ‌بوُن؛ ٤دۆڕاندن لە شەترنجا؛ ٥)جێگیر بوُن ف ١) کزکردن؛ ٢) خاموش شدن؛ ٣)باختن در شطرنج؛ ٥)جایگیر شدن.

**مات‌بە:** ١) را مەبە، خۆ وەشێرە؛ ٢) بێدەنگ‌بە ف ١) خود را نشان مدە،برنخیز؛ ٢) بی‌صدا باش.

**ماتك:** ١)خۆشکی باوك، میمك؛ ٢) بێشکە، دەرگوُش ف ١) عمّە؛ ٢) گهوارە.

**مات کردن:** ١) بێدەنگ کردن؛ ٢) زەقایی نەوی کردنەوە؛ ٣) برێتی لە کوشتن؛ ٤)بـرنەوەی شەترنج ف ١) ساکت کردن؛ ٢)برجستگی را صاف کردن؛ ٣) کنایە از کشتن؛ ٤)بردن شطرنج.

**ماتڵ:** بێکار داماو، شتێ یا کەسێ کە هیچ کاری نەبێ ف معطّل.

**ماتڵ‌بوُن:** بێکارمانەوە ف معطّل شدن.

**ماتڵ کردن:** لە کار وەدواخستن ف معطّل کردن

**ماتلی:** جۆرێ تفەنگ ف نوعی تفنگ.

**ماتلی:** ماتڵ بوٗن، بێکاری ف معطّلی.

**ماتۆر:** ١) ئامرازی وەکارخستنی مەکینە؛ ٢) پایسکلێ کە بە بەنزین دەڕوا، دوچەرخەی بێنزینی ف ١) موتور؛ ٢) موتوسیکلت.

**ماتوڕا:** تەمەڵ، تەوەزەل، کارنەکەر ف تنبل.

**ماتوڕە:** ماتوڕا ف تنبل.

**ماتـە:** ١) خـۆکـزکردن، کروشمە؛ ٢) ناوتێگەڕان و ئاڵ‌وبوڵ بوٗنی میوەی بێستـــان؛ ٣) تـەمی بەرچـاو؛ ٤) کـوٗژەکـەی چاوزار؛ ٥) گونـدێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف ١) کزکردگی؛ ٢) علائم رسیدن در میوهٔ پالیزی؛ ٣) سیاهی پیش چشم؛ ٤) مهرهٔ ضدّ چشم‌زخم؛ ٥) نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**ماتـــەدان:** خۆ بەزەویەوە لکـــانـدن: (کـەروێشـك **ماتـەی داوە**)؛ ٢) ئاڵ‌وبـوڵ بوٗنی میوەی بێستـان: (بێستـانـە کە **ماتەی داوە** بەم زوانە پێ دەگا) ف ١) بەزمین چسپیدن و منتـظر فرصت بودن؛ ٢) ظهـور علائم رسیدن میوهٔ پالیزی.

**ماتەم:** تازیمانە، تازیەباری ف ماتم.

**ماتەمات:** سەبرەسەبرە ڕۆیشتن ف رفتن پاورچین پاورچین.

**ماتەماتە:** ماتەمات ف نگا: ماتەمات.

**ماتەمی:** تازیەبار ف ماتمین.

**ماتەمین:** ماتەمی ف ماتمین.

**ماتی:** ١) سەرسوڕمان؛ ٢) بێدەنگی؛ ٣) خەمباری؛ ٤) ڕەنگی بێ بریقە ف ١) تحیّر؛ ٢) خاموشی؛ ٣) غمگینی؛ ٤) رنگ مات.

**ماج:** ١) ماژ، خزم و پەیڕەوی زەردەشت؛ ٢) ناوی کوٗنی کورد ف ١) ماژ، پیرو زردشت؛ ٢) نام باستانی قوم کُرد.

**ماجر:** کۆچەر ف کوچ کننده، مُهاجر.

**ماجو:** کرێ، پاداشت لە بەرانبەری کاردا ف مزد.

**ماجوج:** یاجوج ف مأجوج.

**ماجـوٗم:** ١) تێکـەڵاوکـراوی چەنـد دەرمـانێك بۆ مەڵحـەم؛ ٢) جۆرێ شیرنیات ف ١) معجون دارویی؛ ٢) نوعی شیرینی.

**ماجوٗن:** ماجوٗم ف نگا: ماجوٗم.

**ماجوە:** شوێنێ کە ئاوی پێدا هاتوەو دیارە ف اثر جاری شدن آب بر زمین.

**ماجیت:** گونـدێکـە لەکوردستان بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**ماجیداوا:** لەو گونـدانـــەی کوردستـانـە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**ماچ:** ١) ڕامـوٗس، رامـوٗسـان، پـاچ؛ ٢) جـگ، میچ، قاپ ف ١) بـوسە؛ ٢) شتالنگ، قاب.

**ماچا:** ناو پەڕێك لە پەڕەکانی پاسوٗر ف از برگهای پاسور.

**ماچان:** ١) چەند ڕاموٗسانێ؛ ٢) ئێژن، دبێژن، دەڵێن؛ ٣) جگێن، قاپێن ف ١) بوسەها؛ ٢) گویند؛ ٣) قاب‌بازی.

**ماچانێ:** جگێن ف بازی با شتالنگ، قاب‌بازی.

**ماچك:** سوٗکەڵەماچ ف ماچ و بوسهٔ کوچك.

**ماچ کردن:** ڕاموٗسان، پاچ کردن ف بوسیدن.

**ماچلەك:** بەندی ئەندام، گەی لەش ف مفاصل اندام.

**ماچماچان:** ئێك و دو ڕاموٗسان ف همدیگر را بوسیدن.

**ماچماچانی:** ماچماچان ف همدیگر را بوسیدن.

**ماچماچۆك:** ماچماچان ف همدیگر را بوسیدن.

**ماچمێ:** دبێژین، ئەوشین، دەڵێین ف می گوییم.

**ماچۆ:** ئێژێ، دبێژە، دەڵێ ف می گوید.

**ماچوموٗچ:** ماچماچان ف همدیگر را بوسیدن.

**ماچـە:** مێوینـە، ما. بوٗئێستـرو جاشەکەری دەڵێن ف ماچه، ماده. ویژهٔ *استر و کرّه‌خر.*

**ماچی:** ١) دەڵێم؛ ٢) توٗئێژی، هەر دەڵێی؛ ٣) ئەدی چوٗن؟؛ ٤) ڕاموٗسانی ئەو ف ١) گویم؛ ٢) توگویی؛ ٣) پس چگونه؟؛ ٤) بوسهٔ او.

**ماچیك:** ١) ماچ، ڕاموٗسان؛ ٢) دانێ ماچ ف ١) بوسە؛ ٢) بوسەای.

**ماچێن:** ماچانێ ف قاب‌بازی.

**ماحبەین:** مابەین ف نگا: مابەین.

**ماخ:** ١) کاریتەی سەربان؛ ٢) ڕیزە ئاڵودار؛ ٣) نزمی نێوان دو بەرزایی؛ ٤) نهـوٚم ف ١) بـالار؛ ٢) الـوارهـای سقف؛ ٣) پستی مابین دوبلنـدی؛ ٤) طبقه، اشکوبه.

**ماخۆ:** خاوەن، خودان، خێو، ساحێب، ساحێو ف صاحب.

**ماخۆبزنان:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**ماخـــوٚلان:** ١) خولخـولـە؛ ٢) نـەخـۆشی سەرلـەرزین ف ١) گردنـا؛ ٢) بیماری لرزش سر.

**ماخـولیا:** ١) گێژو حوٚل؛ ٢) نـەخـۆشیەکە، ئەسپەك ف ١) گیج و هالو؛ ٢) بیماری مالیخولیا.

**ماد:** ١) ناوێکی کەونارای کورد؛ ٢) دەوڵەتی کورد لەهەمەدانی پێشو ف ١) قوم ماد؛ ٢) دولت ماد.

**ماداك:** گامێش ف گاومیش.

**مادام:** ١) خامی ڕەشی بریقەدار؛ ٢) تا وایە، هەتا وایە ف ١) متقال سیاه برّاق؛ ٢) مادام که.

**مادك:** با بوٚڵەی زاروٚ تێوەپێچان ف قُنداق بچّه.

**مادوکی:** سەردەمی ڕێك کەوتنی نێر و مێی کۆتر پێکەوە ف دوران نامزدی کبوتران.

**مادە:** ١) جـــوٚرێ نان؛ ٢) رفـــێدەی نان پێوەدان؛ ٣) کرش، عور؛ ٤) دومەڵە، کوان؛ ٥) لوٗ، لك، گرێی گوٚشت؛ ٦) دایك؛ ٧) هەوێن، ئامیان ف ١) نـوعی نان؛ ٢) بـالشتـك نانـوایی؛ ٣) معده؛ ٤) دُمَل ٥) غدّه؛ ٦) مادر؛ ٧) خمیرمایه.

**مادەر:** دایك ف مادر.

**مادەربەچە:** تەقەڵی وردو درشت پێکەوە بوٚ جوانی ف کوك ریز و درشت باهم.

**مادەرزا:** وەك لە دایك بوە، کە لە دایك بوە: (**مادەرزا کوٚرە**) ف مادرزاد.

**مادەرزاد:** مادەرزا ف مادرزاد.
**مادەرمەردە:** میوەی بێستانی سیس هە ڵگەڕاوی پلیخاو ف میوهٔ پالیزی پژمردهٔ لهیده.
**مادەك:** ماداك، گامێش ف گاومیش
**مادەم:** ۱)جاکەوایە؛ ۲)تاوایە ف ۱)اگر چنین است؛ ۲)مادامی که، تا چنین باشد.
**مادەن:** کان، کانگە ف معدن
**مار:** ۱)جـانەوەرێکی خزۆکی درێژۆکەی بەدرێشۆکەیە ژاری هەیەو پێوە دەدا؛ ۲)خانو، جێگەی لێ‌ژیانی خێزان ف ۱)مار؛ ۲)خانە.
**ماراقی:** جۆرێ ماسی کە لە ماردەکا ف مارماهی.
**مارانگاز:** مارپێوەداو ف مارگزیدە.
**مارانگەز:** مارپێوەداو ف مارگزیدە.
**مارانگەستە:** مارانگاز ف مارگزیدە.
**ماراو:** هات، بەخت، ئیغباڵ، تالح ف شگون، شانس.
**مارای:** شکان ف شکستن.
**ماربڕین:** مارەبڕان، لێك حەلاڵ کردنی ژن و پیاو ف عقدکُنان.
**ماربیچ:** لولەی درێژی قلیان ئاوی ف مارپیچ قلیان.
**مارت:** ئادار، سێهەمین‌مانگی ساڵی خاچ‌پەرستان ف ماه‌مارس.
**مارتـاك:** ئالاش، پوش و چرۆی سەرمیچی خانـو ف ترکـه و گیاه سقف‌پوش، انبیره.
**مارتلی:** ماتلی ف نوعی تفنگ.
**مارتـولـە:** ۱)تولەمار، بەچکەمار؛ ۲)ماری باریك؛ ۳)کرمی درێژی ناو سك؛ ۴)مارمێلکە ف ۱)بچەمار؛ ۲)مارباریك؛ ۳)کرم دراز معده؛ ۴)سوسمار.
**مارتین:** مارتلی ف نوعی تفنگ.
**مارجو:** نیسك ف عدس.
**مارجەفری:** جۆرێ مار ف نوعی مار.
**مارچێو:** داری سەردوفلیقانە بۆ مارگرتن ف چوب دوشاخهٔ مارگیران.
**مارچێوە:** ۱)مـارچێو؛ ۲)گیایەکـە ف ۱)چـوب دوشـاخـهٔ مارگیری؛ ۲)گیاهی است.
**ماردا:** مردو، مردگ ف مُرده.
**ماردش:** ۱)مـردن، مەرگ؛ ۲)دوایی‌هاتن، تەواوبـوُن ف ۱) مُردن؛ ۲) تمام شدن.
**ماردن:** شکاندن ف شکستن.
**ماردە:** ماردا، مردگ ف مُرده.
**ماردەم:** جۆرێ تفەنگ ف نوعی تفنگ.
**ماردین:** شارێکە لە کوردستان ف نام شهری در کردستان.
**مارز:** ۱) زاڵم؛ ۲)لاسارو سەرسەخت ف ۱) ستمگر؛ ۲) لجباز.
**مارزا:** گوی ئاژەڵی ساوای شیرەخۆر کە زەردو شلە ف مدفوغ نوزاد دام.
**مارزەیە:** مارانگاز ف مارگزیدە.
**مارزیای:** بەجێ هێڵراو، تەرك کراو ف متروك، مهجور.
**مارژوك:** بوُکمار، جۆرێ مارمێلکە ف نوعی مارمولك.
**مارژی:** نیسك، مارجو ف عدس.
**مارس:** مارت ف ماه مارس.
**مارس:** مارز ف نگا: مارز.
**مارسیس:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.
**مارك:** پیـرۆز ف مبارك، خجسته.
**مارکرن:** ماربڕین ف عقد کردن.
**مارکونە:** دەسخۆشانەی شاگرد، شاگردانە ف انعام شاگرد.
**مارکـە:** ۱) راوکـە مریشـك؛ ۲)ئـەو هێلکەی کە لە کولێن دای‌دەنێن بۆئەوەی مریشك هەرلەوێ هێلکی تربکا ف ۱) رامك؛ ۲)تخم مرغی که در لانه تخمگذار می‌نهند تاتخمش را همانجا بگذارد.
**مارگر** کەسێ کە مار حەمایەت دەکا،کەسێکە مار دەگرێ‌پێوەی نادا ف مارگیر.
**مارگروس:** نێرەکەوێ کە ماکەو خۆی لێ بواردوە ف کبك نری که ماده‌اش را نمی‌یابد.
**مارگرە:** مارچێوە ف نگا: مارچێوە.
**مارگەستی:** مارانگاز ف مارگزیدە.
**مارگیر:** ۱) گیایەکی دڕکاوی‌یە؛ ۲) مارگر ف ۱) گیاهی است خاردار؛ ۲) مارگیر.
**مارگیس:** جۆرێ مارمێلکە ف نوعی سوسمار.
**مارگیسك:** ۱)مارگیس؛ ۲)ماری ژەهردار؛ ۳) برێتی لە مرۆی بێ‌فەڕو خراو ف ۱) سوسمار؛ ۲) مار سمّی؛ ۳) کنایه از شخص بدجنس و کج رفتار.
**مارگیسە:** بوقلە، بەقلەموت، عەلەشیش، عەلوعەلو ف بوقلمون.
**مارمار:** ماڵ‌ماڵ، قارەمانێکی بەیتی کەونارایە:(ناسر و مارمار) ف ) از شخصیت‌های افسانه‌ای فولکلور.
**مارمارك:** کرمی درێژی ناو سك ف کرم دراز معده.
**مارماروشك:** ۱)مارمێلکە؛ ۲)گیایەکە شیرەکەی ژەهرە ف ۱) مارمولك؛ ۲) گیاهی است که شیره‌اش سمّی است.
**مارماروك:** ۱) مارمێلکە؛ ۲) هەرشتی درێژو بەپێچ کە لە مار بکار ف ۱) مارمولك؛ ۲) هر چیز مارمانند.
**مارماروکە:** بازنەی لەهەویری برژاو ف نان النگو مانند.
**مارماسە:** مارماسی، ماراقی ف مارماهی.
**مارماسی:** جۆرێ ماسی‌یە وەك مار دەچێ پێوەناداو گۆشتی دەخورێ ف مارماهی.
**مارمالوك:** مارمێلکە ف سوسمار.
**مارمزوك:** ۱)بێچوەمار؛ ۲)مارمێلکە ف ۱) بچەمار؛ ۲) مارمولك.
**مارمـەژ:** دەم بە جێگـەی مارانگـەستـەوە نان و لوشینی ژار بۆ چارەی مارانگاز ف مکیدن جای نیش مار به قصد معالجه.
**مارملیك:** مارمێلکە ف مارمولك.
**مارمەزوکە:** مارمێلکە ف مارمولك.

**مارمێزولکه:** مارمێلکه ف مارمولك.
**مارمێژ:** مارمژ ف نگا: مارمژ.
**مارمێلك:** جانەوەرێکی پچوکی بۆرەلۆکەیە لە کورتەمار دەکاو دەست‌و پای هەیە لە سەر مێش‌و جانەوەری پچوك دەژی‌و پێوەنادا ف مارمولك.
**مارمێلکە:** مارمێلك ف مارمولك.
**مارمیلۆك:** مارمێلکە ف مارمولك.
**مارنەگەز:** بەلەك‌پێچی لباد ف ساق‌پیچ نمدی.
**مارنەینك:** جۆرێ مارە ف مار عینکی.
**مارۆ:** ۱)قـەشـان، حەیوانی ڕەشی ناوچـاوسپی؛ ۲)ئـەسپێ کە خاڵی چەرمـگ لە پای دایە ف ۱)دام سیاهِ پیشـانی سفید؛ ۲)اسبی کە خالهای سفید دردست وپادارد.
**مارو پیر:** جوێنێکە واتا: شەرمی دایکت ف دُشنامی است.
**مارۆت:** فریشتەی هەواڵی *ناروت* کە خوایان تۆڕە کردوە ف نام فرشتەای کە مغضوب خدااست.
**ماروتە:** قولاخە، خزگەی ماسی لە زستان‌دا ف پناهگاه ماهیان در زمستان.
**مارۆخە:** پارچەزەوی بچوك ف قطعە زمین کوچك.
**مارودو:** قیلەوقاچ، فیچەلفاچ ف مورّب.
**مارۆژە:** گیایەکە دەخورێ ف گیاهی است خوردنی.
**مارۆسـیا:** ۱)مـاری ڕەش؛ ۲) بریتـی لە مرۆی دژی دل‌بەکین ف ۱) مارسیاە؛ ۲) کنایە از دشمن کینەتوز.
**مارول:** خاس، کاهو ف کاهو.
**ماروموُر:** خزۆك، هەرجانەوەرێ بەزەویدا خشکە دەکا ف خزندە.
**مارومێرو:** بریتی لە هەمـوشتێکی خرت‌و پرت: (سەری **مارو مێروی** هەیە) ف کنایە از انواع خرت و پرت.
**مارە:** ژن بەپیاودان بە ڕێ‌و شوێنی ئاینی ف عقد ازدواج.
**مارە:** مارکە، راوکە ف رامك.
**مارەبڕ:** کچێ کە بە زارۆکی بە شوُ دراوە ف دختر عقد شدهٔ نابالغ.
**مارەبڕانە:** پارەیەك کە ژنی لەسەر مارە دەکرێ ف صداق، مهریە.
**مارەبڕی:** ۱)بە ڕێو شوێنی ئاینی ژن دان بە شوُ؛ ۲)مارە بڕانە ف ۱) عقد کردن؛ ۲)صداق.
**مارەبڕیاگ:** ژنێ کە بە شوُ دراوەو هێشتا نەچۆتە ماڵ شوُ ف عقد شدە.
**مارەبڕین:** ژن کردنەحەلاڵی پیاو بە ڕێو شوێنی ئاینی ف عقد کردن.
**مارەرەش:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان کە توسط بعثیان ویران شد.
**مارەزا:** شلەگوی ساوای ئاژەل ف مدفوع نوزاد حیوانات.
**مارەزیو:** زێلو، هەزارپێ ف هزارپا.
**مارەك:** مارك، پیرۆز ف خجستە.
**مارە کراو:** مارە بڕیاگ ف عقد شدە.
**مارە کردن:** مارەبڕین ف عقد کردن.
**مارە کوڵ:** دومارە کوڵ، دوپشك ف عقرب.
**مارە گوێز:** تیرەی درێژی ئاو بۆ سەر گۆلەمەرەزە ف جوب طویل آبرسانی بە کرد شالیزار.
**مارە گیرە:** مارچێوە ف نگا: مارچێوە.
**مارەیی:** مارەبڕانە ف صداق.
**ماری:** ماکەو ف کبك مادە.
**مارێ:** چوخم، چوخمە ف ۱)اتاق بالای راهرو؛ ۲) کوچهٔ‌تنگ.
**ماری‌پشت:** مۆغەرەی پشت ف ستون فقرات.
**ماریژۆك:** گیایەکە، مارۆژە ف گیاهی است.
**ماریژە:** مارۆژە ف گیاە «مارۆژە».
**ماریس:** مارز، زاڵم، لاسار، سەرڕەق ف دیکتاتور.
**ماریستان:** شوێنێ کە زۆر ماری هەس ف جایی کە مار بسیار دارد.
**ماریشۆك:** مارمێلکەی زەلام ف مارمولك بزرگ.
**ماریفەت:** ڕوخۆشی‌و ناکارپەسندی ف خوش اخلاقی.
**ماریلە:** مارمێلك ف مارمولك.
**مارین:** گیایەکە ف گیاهی است.
**مارین:** شکاندن ف خُردکردن، شکستن.
**مارینـە:** شوینـەوارێکی کەونـارایە لە کوردستانی بەردەستی ترکان ف ازآثار باستانی در کردستان.
**ماز:** ماج ف خویشاوند و پیرو زردشت، ماژ.
**مازان:** ۱) کەڵو گامێشی ناوچاوان‌و کلك‌سپی؛ ۲) گەپ، زەلام، گەورە ف ۱) گاومیش پیشانی و دُم سفید؛ ۲) بزرگ.
**مازبەر:** نەخۆشیەکە لە سمی ئاژەڵ پەیا دەبێ ف از بیماریهای دام.
**مازتر:** گەپتر، زلتر، مەزنتر، گەورەتر ف بزرگتر.
**مازگ:** بەری دارێکی لێڕەوارە ف مازوج.
**مازگا:** پێشەی کلێنچکە ف استخوان دنبالچە.
**مازگە:** بڕبڕەی پشت ف ستون فقرات.
**مازگێرت:** ناوچەیەکە لە کوردستانی ژێردەستی ترکان ف ناحیەای در کردستان.
**مازلوخ:** دوگرد، بەرماڵی نوێژ ف سجّادە، جانماز.
**مازماز:** بەرانی قەحل، بەرانێ کە دە پەزی بەردەدەن ف راك گُشن.
**مازن:** ۱) گـەورە، گەپ، زل؛ ۲)سەرۆکی عاشیـرەت ف ۱)بزرگ؛ ۲)سردارایل.
**مازوُ:** مازگ ف مازوج.
**مازوُبـەرەلا:** وشـەیەکە بۆ مازۆڵێکردنەوە بەئازادی دەگوترێ ف بانگ مازوج چینی آزاد.
**مازوُچن:** کەسێ کە مازوُ لە دار دەتەکێنێ‌و کۆدە کاتەوە ف مازوج چین.
**مازوُدار:** دارمازوُ ف درخت مازوج
**مازور:** بێکار ف بیکار.
**مازوُڤان:** خانەخوێ، خاوەن‌ماڵی میوان حاوێنەوە ف میزبان مهمان‌نواز.
**مازوڵ:** کاربەدەستی دەرکراو ف معزول.
**مازوُڵی:** دەرکراوی لە سەرکار ف معزولی.
**مازوُڵی کێش:** دۆستی بەئەمەگی کۆنەکاربەدەست ف دوست وفادار در

زمان معزولی.
**مازه:** ۱) ناوەڕاستی پشت، موَغــەرە، بڕبــڕەی پشت؛ ۲)شــان، پیل؛ ۳)دارێ کەچــەرخی عارەبەی پێوەیەو دەگەڕێ [ف] ۱) ستون فقرات؛ ۲)کتف؛ ۳)چوب محور چرخهای گاری و...
**مازی:** ۱)مازوُ؛ ۲)بڕبڕەی پشت [ف] ۱)مازوج؛ ۲)ستون فقرات.
**مازێ:** ناوی چیایەکە لە کوردستان [ف] نام کوهی در کردستان.
**مازیچن:** مازوُچن [ف] مازوج چین.
**مازیر:** سمەشلە، نەخۆشی سمی ئاژەڵ [ف] بیماری سُم دام.
**مازێر:** داربەڕوی ئەستوُر [ف] درخت بلوط بزرگ.
**مازیێ:** گونــدێکی کوردستــانە بەعسی کاولی کرد [ف] نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.
**ماژ:** ماز، ماج، خزمو پەیڕەوی زەردەشت [ف] ماژ.
**ماس:** ۱)شیری گەرم‌کراوی ئامیان‌تێکــراوی تونــدەوەبو؛ ۲)پەنەم [ف] ۱)ماست؛ ۲)آماس.
**ماسا:** ماسی [ف] ماهی.
**ماسان:** ئەستوُربوُنی ئەندام [ف] آماسیدن.
**ماســاو:** ۱)ئــەستــوُربــوُگ، پەنەماو؛ ۲)جانەوەرێکە هەر لە ئاودا دەژی گۆشتی خۆشەو یەکجار زۆرە؛ ۳)ماستاو [ف] ۱)آماسیده؛ ۲)ماهی؛ ۳)آبدوغ.
**ماساوە:** گیایەکی تام‌تیژە [ف] گیاهی است تندمزه.
**ماسایا:** ماسان، پەنەمان، ئەستوُربوُن [ف] آماسیدن.
**ماسایش:** ماسایا [ف] آماسیدن.
**ماسایە:** ماسایا [ف] آماسیدن.
**ماست:** ماس، شیری ئامیان تێدراوی توندەوەبوُگ [ف] ماست.
**ماستاف:** ماستاو [ف] نگا: ماستاو.
**ماستاو:** ماستی لە ئاودا لێك‌دراوی بە مەشکە نەژێنراو [ف] ماست و آب بەهم زده، دوغ مشك ندیده، آبدوغ.
**ماستاوسارد کردنەوە:** برێتی لە ڕوبینیو کلکەسوُتە [ف] کنایه از تملّق و چاپلوسی.
**ماستــاوکــردن:** ۱)مــاستــاو ساز کردن؛ ۲)ماستاوساردکردنەوە [ف] ۱) ماست و آب بەهم زدن؛ ۲) تملّق کردن.
**ماستاوی:** شتێ کە ماستی پێوە بێ: (کەواکەم **ماستاوی بو**) [ف] ماست آلوده، آغشته به‌ماست.
**ماستبا:** دوخەوا، دۆکلێو [ف] دوغبا.
**ماستبڕ:** سمەشلە، نەخۆشیەکی ئاژەڵە [ف] از بیماریهای دام.
**ماستر:** زلتر، گەورەتر، مەزنتر [ف] بزرگتر.
**ماستروُن:** توێژ لەسەر توێژی ڕۆن‌و ماست کە بۆزستان هەڵدەگیرێ [ف] ذخیرهٔ ماست و کره.
**ماست‌ومــوُبژاردن:** برێتی لە بە وردی توێژینەوە لە کارێ [ف] کنایه از با دقّت تحقیق کردن.
**ماستەرگ:** کوَڤك، ڕەحاتی [ف] قیف.
**ماســتــەڕۆن:** توێژ توێژی ماســت‌و ڕۆن لە سەریەك کە بۆ زستــانی هەڵدەگرن [ف] لایه‌لایهٔ ماست و کره برهم که ذخیره می کنند.
**ماستێر:** ڕەحاتی، کوَڤك، ماستەرگ [ف] قیف.
**ماسریشم:** سرێشێ کە لە ماسی دەگیرێ [ف] چسبی که از ماهی گیرند.
**ماسرێشمە:** گیاچرێش [ف] گیاه سریش.
**ماسك:** شکڵێ کە بە ڕوُیەوە دەگرن تا نەناسرێن [ف] ماسك.
**ماسکە:** ماسك [ف] ماسك.
**ماسکەش:** دەویت [ف] جاکش.
**ماسمــاڵی:** ۱) پۆشینی تاوان بەنارەوا؛ ۲)ماست بە سەر ژنی خراپدا کردن‌و بە دێدا گەڕاندن [ف] ۱)ماستمالی؛ ۲) ماست بر سر زن بدکاره ریختن و در ده گرداندن.
**ماسو:** دێیەکە لە کوردستان [ف] نام دهی است.
**ماسوَ:** ماساو، جانەوەرێ کە بە بێ ئاو ناژی [ف] ماهی.
**ماســوُر:** ۱)بــەری دارێکی دڕکــاویە لە عەنئــاب دەکــا؛ ۲)ماسولکەی جوَڵایی [ف] ۱) ثمر درختی است شبیه عنّاب؛ ۲) ماسوُلهٔ نساجی.
**ماســورا:** ۱)باکردن‌و هەڵمسان؛ ۲)نەخوَشی بای‌سوُر [ف] ۱)آماسیدن؛ ۲)بیماری بادسرخ.
**ماسول:** ۱) ماسوَ، ماساو؛ ۲) پلیتەچرا؛ ۳) داهاتی زەوی [ف] ۱)ماهی؛ ۲)فتیله؛ ۳)محصول زمین.
**ماســوُلکە:** ۱) ماسوَی بچوُك؛ ۲) شارەی چاڵ؛ ۳) باریکەی سوُری خەرمان کە هێشتا نەبوَتە کوَ؛ ۴) لەتەقامیشێکی کورتە جوَڵا داوی لێ دەپــێچــن بوَ تەنــین؛ ۵)گوَشــتــی پتــەوی ناوەڕاست ئەستــوُری ئەولاولا بــاریك [ف] ۱)ماهی کوچك؛ ۲)کاه کنار چالهٔ غلّه؛ ۳)باریکهٔ خرمن توده نشده؛ ۴)ماسورهٔ بافندگی؛ ۵)ماهیچه.
**ماســوَڵــە:** ۱) ماسوُلکەی جوَڵایی؛ ۲) ماسوُلکەی گوَشت؛ ۳) جوَرێ ساج؛ ۴) گلوَڵەی فرێت [ف] ۱) ماسورە؛ ۲) ماهیچه؛ ۳) نوعی ساج؛ ۴) گلوله نخ پود قالیبافی.
**ماسە:** ڕەمڵ، مڵ، کفت، لم [ف] ماسه.
**ماسەنە:** پەنەماندن [ف] متوّرم کردن، آماسانیدن.
**ماسەوا:** دوَکلێوی بەماست [ف] آش ماست.
**ماسی:** ۱)ماسوَ؛ ۲)پەنەما؛ ۳)ماست‌فروَش؛ ۴)ماستاوی [ف] ۱)ماهی؛ ۲)آماس کرد؛ ۳)لبنیات فروش؛ ۴)ماست آلوده.
**ماسیان:** ماسان، پەنەمان [ف] آماسیدن.
**ماسی‌بڕەك:** ماسیەك ددانی وەك هەڕەیەو درێژە [ف] ارّه‌ماهی.
**ماسی‌پانك:** جوَرێ ماسی [ف] ماهی سوف.
**ماسی‌پەڕك:** جوَرێ ماسی [ف] ماهی کفال.
**ماسی‌خاتوُنەك:** جوَرێ ماسی [ف] نوعی ماهی قزل‌آلا.
**ماسی‌خڕك:** وردیلە ماسی [ف] ماهی بسیار ریز.
**ماسی‌خوَرە:** باڵدارێکی سپیە ڕاوەماسی دەکا [ف] قاق، مرغ‌ماهیخوار.
**ماسی‌ستێرك:** جانەوەرێکی دەریاییە [ف] ازجانوران آبزی.
**ماسی‌سوَڵ:** ماسی خوێ‌کراوی وشکەوەکراو [ف] ماهی نمك سود، ماهی شور.
**ماسی‌سوَڵ‌وخوا:** ماسی‌سوَڵ [ف] ماهی شور.

**ماسی‌فرۆش:** کەسێ کاری ماسی فرۆشتنە ف ماهی فروش.

**ماسی‌فڕۆك:** جۆرێ ماسی کە مرۆ لای وایە ئەفڕێ ف نوعی ماهی.

**ماسی‌فرەك:** ماسی فڕۆك ف نوعی ماهی.

**ماسیڤان:** کەسێ کاری هەر ڕاوەماسیە ف صیّاد ماهی.

**ماسی کارتۆخك:** سفرەماسی ف سفرەماهی.

**ماسی کەران:** بێچوەبۆق ف بچهٔ غوك.

**ماسی گر:** کەسێ ڕاوەماسی دەکا ف ماهیگیر.

**ماسی گرە:** ماسی‌خۆرە ف مرغ ماهیخوار.

**ماسی گرەك:** ماسی گرە ف مرغ ماهیخوار.

**ماسی گیرە:** ماسی گرە، ماسی‌خۆرە ف مرغ ماهیخوار

**ماسیلکە:** ماسولکەی لەشی زیندەوەر ف ماهیچە.

**ماسی‌لۆلـــۆ:** جۆرێ وردەمـاسی لە ڕوبـاردا کە دەیکـەنـە چێشتـەی ماسی‌گرتن ف نوعی ماهی ریز کە آن را طعمە می کنند.

**ماسیلە:** مارمێلکەی ناوخانوان کە لە جێگەی شەدار دەژی ف مارمولکی کە در خانەها و درجای مرطوب زندگی می کند.

**ماسین:** ۱) پەنەمین، پەنەمان؛ ۲) توێژی مەیوی ڕۆن‌و چەوری بە سەر شتێکەوە ف ۱) آماسیدن؛ ۲) لایهٔ چربی بر چیزی بستەشدن.

**ماسی‌نێزەدار:** جۆرێ ماسی قورتم درێژ ف نیزەماهی.

**ماسیەپانکە:** جۆرێ ماسی ف نوعی ماهی.

**ماسیەخاتونە:** جۆرێ ماسی پنۆك‌پنۆك ف نوعی ماهی خالدار.

**ماسیەزەردە:** زەردەماسی، جۆرێ ماسی ف زردماهی.

**ماسیەوان:** بنیادەمێ کە ڕاوەماسی دەکا ف ماهیگیر.

**ماسیەوچنە:** ماسی گرە ف مرغ ماهیخوار.

**ماسی‌هۆرك:** جۆرێ ماسی کە لە ناو قوتو دەکرێ ف ماهی تُن.

**ماش:** ۱) تامانێکە دە سەری دۆلاشی دەگرن تا پوش‌و چیلکە بگرێتەوەو نەگاتـە زەنبـورە؛ ۲) ئاوی ڕاوەستاو؛ ۳) ئەوەی بەر گەسك دێت؛ ۴) دانـەوێڵەیەکی شین‌باوە بە چێشت لێ‌دەنرێ‌و دەنکی خڕی وردە ف ۱) آبکشی کە در دهانهٔ ناوآسیا نهند؛ ۲) آب راکد؛ ۳) روبیدنی؛ ۴) دانهٔ آشی ماش.

**ماشانن:** ۱) گزك‌دان، گەسك‌لێدان، جاڕوکردن؛ ۲) دەست‌گێڕان ف ۱) جاروکردن؛ ۲) دست گرداندن.

**ماشاو:** ئاومرواری، نەخۆشیەکی چاوە ف آب مروارید، از بیماریهای چشم.

**ماشتن:** گەسك‌دان ف جاروکردن.

**ماشقە:** گراوی، دۆستی مێوینە، زۆرتر بۆ ماری دەڵێن: (ئاشقەو ماشقە) ف معشوقە.

**ماشك:** جۆرێ لوبیا ف لوبیا چشم بلبلی.

**ماشکان:** ناوی دێیەکە ف نام دهی است.

**ماش کردن:** زۆری‌هێنانی ئاوی ڕاوەستاو بۆ ڕژان ف فشار آوردن آب راکد.

**ماشکە:** ماشقە ف معشوقە.

**ماشگە:** ناوی چەند دێیەکە لە کوردستان ف نام چند آبادی.

**ماشڵێن:** چێشتی ماش ف آش ماش.

**ماشوبرنج:** برێتی لە موی سپی‌و ڕەشی تێکەڵ ف موی جوگندمی.

**ماشـــۆت:** ۱) کلافـەئـاوریشـمـی خۆرست‌و دەست‌لێ‌نەدراو؛ ۲) گیانداریکی پچوکە ملۆزمی نۆك‌و باقلەی سەوزە ف ۱) پیلهٔ ابریشم؛ ۲) حشرهٔ آفت نخود و باقلی.

**ماشە:** ۱) سەبەتەیەکی دەم‌تەنگی بن فرەوانە ڕاوەماسی پێ دەکەن؛ ۲) پۆلوگر، پەنگر؛ ۳) پەلەپیتکەی چەکی گەرم ف ۱) سبد تلەماهی؛ ۲) انبر؛ ۳) ماشهٔ سلاح.

**ماشەر:** کلافەبەنێکە لە نێوان دو ئەژنۆدا هەڵدەکرێ ف گروهەریسی کە میان دو زانو پیچند.

**ماشەرز:** گازی بزمارکێشانەوە ف گازانبر، کلبتین.

**ماشەرك:** فرێت، تۆپەڵەبەنێ کە دە تەونەوە دەدرێ ف پودی کە با دست لای تار گذارند.

**ماشەرە:** ۱) ماشەر؛ ۲) ماشەرك؛ ۳) ئاورە، ئاگرە، جۆرێ کوانە لە دەم‌و چاو ف ۱) نگا: ماشەر؛ ۲) نگا: ماشەرك؛ ۳) آتش پارسی، نوعی دُمَل.

**ماشەڕەش:** دانەوێڵەی ماش ف دانهٔ آش ماش.

**ماشـەسپی:** دانەوێڵەیەکە پانکەڵەو سپی‌و تام‌خۆش لە کەلودا دەبێ ف لوبیا سفید.

**ماشەسپیلکە:** ماشەسپی ف لوبیا سفید.

**ماشەك:** ماشە، پەلەپیتکەی چەکی گەرم ف ماشهٔ اسلحە.

**ماشەڵ:** چەپەر لەبەر ڕوبار بۆ ماسی گرتن ف نوعی دام ماهیگیری.

**ماشەڵان:** سروەبای خۆراوا ف نسیم غروب.

**ماشەڵلا:** وشەی سەیرمان ف ماشاءاللّٰه، کلمهٔ تعجّب.

**ماشین:** ۱) گسـك‌دان‌و خاوێن کردنـەوە؛ ۲) ترومبیل ف ۱) روبیدن و تمیزکردن؛ ۲) اتومبیل.

**ماشێن:** ۱) چێشتی ماش، ماشڵێن؛ ۲) هەر ئامرازێ بە ماتۆڕ کار دەکا؛ ۳) ترومبیل ف ۱) آش ماش؛ ۲) ماشین، ابزار ماشینی؛ ۳) اتومبیل.

**ماشێنە:** ۱) ماشڵێن، ماشێن، شێوی ماش؛ ۲) ئامرازی جلدرون ف ۱) آش ماش؛ ۲) چرخ خیّاطی.

**ماشێنەچی:** جلدرو، خەیات ف خیّاط.

**ماشینەوە:** برێتی لە خواردنی یەکجار زۆر: (هەمو خواردنەکەی یەکجێ ماشیەوە) ف کنایە از زیادخوردن.

**ماشێوە:** ڕاوك، پاڵوێنە ف پالونە.

**ماع:** باع، هاواری مەڕو بزن ف بع، صدای بز و گوسفند.

**ماعبەین:** مابەین ف نگا: مابەین.

**ماعبێن:** مابەین ف نگا: مابەین.

**ماعتاج:** ئاتاج، هەژار ف محتاج.

**ماعتاژ:** ماعتاج ف مُحتاج.

**ماعـد:** ۱) ڕەنـگ‌وڕۆ؛ ۲) واز، ئیشتیا؛ ۳) برێتی لە هەنـاسـەو هەنـاو: (مـاعـدی خۆتـەنگ کەردش) ف ۱) سیما؛ ۲) اشتها؛ ۳) کنایە از حالات درونی.

**ماعدە:** ۱) ورگ، ماعور؛ ۲) ئیشتیا، واز ف ۱) معدە؛ ۲) اشتها.

**ماعدەن:** ١) کان، کانگا؛ ٢) مەڵبەندێکە لە کوردستان ف ١) معدن؛ ٢) ناحیەای در کردستان.

**ماعزمە:** ئامرازی کار، ئامیر ف ابزارکار.

**ماعزەمە:** ماعزمە ف ابزارکار.

**ماعشلێر:** شەقەمێو، بنەڕەزی ئەستوُر ف تنۀ تاك.

**ماعشێل:** ماعشلێر ف تنۀ تاك.

**ماعکوم:** بەندی، حوکم کراو بەپێی قانون ف زندانی محکوم.

**ماعملە:** مامڵە، ساردوسەودا، مامەڵە ف معامله.

**ماعمەلە:** مامەڵە، داوستە ف معامله.

**ماعنا:** واتا ف معنی.

**ماف:** بەش، هەق: (**مافت** بە سەر ئەو ماڵەوە نیە، منیش **مافم** پێوەیە) ف سهم، حصّه.

**مافندی:** بەش بڕاو، دەم‌لەپوُش ف بی‌نصیب، مُفلس، ورشکست.

**مافنگی:** مافنـدی: (تـەواو لە ماڵـەکـەی **مافنگی** کراوە، چی نەمـاوە **مافنگی** بوە) ف نگا: مافندی.

**مافوُر:** رایەخی بە تەون تەنراوی پر زەدار، **قاڵی** ف قالی، فرش.

**مافوُرە:** مافوُر ف فرش، قالی.

**مافوُیر:** مافوُر ف قالی.

**مافە:** دارێ کە بە دەرگاوە دەندرێ بوْ داخستن ف چو بی که در را بدان بندند.

**مافەتا:** ١) پەتا، درم، ئازار، دەردی گیروْ؛ ٢) گیابڕ، ئەو کرمەی کە مالاّت بە گیاوە دەیخواو دەردی تێ‌دە کەوێ؛ ٣) بریتی لە بنیادەمی بەزەرەرو خراپ ف ١) بیماری واگیر؛ ٢) کرم کشندۀ دام که بر علف نشیند؛ ٣) کنایه از آدم موذی.

**مافەتە:** مافەتا ف نگا: مافەتا.

**ماڤاژی:** قسەی من، گفتی من ف گفتۀ من.

**ماڤاژیمە:** من ئێژم کە ف من می گو یم که.

**ماق:** جاوزەق ف چشم برآمده، خیره.

**ماقوڕ:** بەردی قوُڵ کە ئاوی تێدا ڕادەوستێ ف سنگ گود که آب باران درآن جمع شود.

**ماقـوُر:** ١) بەڕێز، بەحـورمەت؛ ٢) قسەی دڵ‌پەسند ف ١) محترم؛ ٢) حرف قابل قبول، سخن مقبول.

**ماقوُڵ:** ماقوُر ف نگا: ماقوُر.

**ماك:** ١) هەر ڕەگەزو بنچینەیێ کە شتی لێ پێك‌هاتوە، هوْی دروس بوُن؛ ٢) دایك: (زاو **ماك** تێکـەڵن)؛ ٣) ئاسـوْ، ئاسوْگ؛ ۴) شاهەنگ؛ ۵) کون‌و لانەی دڕندەو کێوی؛ ۶) ئەستوُربوُنی جێگەی ئاوڵەکوتان؛ ٧) زیپکـەی ناو چاو بەهـوْی ئاوڵـەوە؛ ٨) زەوی بەبڕشت؛ ٩) قوْبچە، بشکوژ، دوگمە؛ ١٠) جوْرێ موروی بریقەدار ف ١) مادّه؛ ٢) مادر؛ ٣) افق؛ ۴) زنبور عسل مادر؛ ۵) لانه و کنام درنده و کوهی؛ ۶) وَرَم جای آبـلەکـوبی؛ ٧) جوش آبله در چشم؛ ٨) زمین حاصلخیز؛ ٩) دکمه؛ ١٠) نوعی مهرۀ زینتی برّاق.

**ماکاف:** ١) جوْگەی گەورە کە جوْی تری لێ‌دەبنەوە لە ئاوداشتنا؛ ٢) چەند دەستەکە دێراو پێکەوە ف ١) جوی اصلی در آبیاری؛ ٢) چند دسته جوی کوچك در کشتزار.

**ماکاو:** ماکاف ف نگا: ماکاف.

**ماکبڕ:** لە شیر گرتنەوەی بەرخ‌و کار ف ازشیر بازگرفتن برّه و بُزغاله.

**ماکوْ:** پاکوْ، بەسەریەکادراوی گیای دوراو ف دروشدۀ انباشته.

**ماکوُ:** جێگەی ماسولکە لە ئامرازی جوْلاّیی‌دا ف مکوك جولایی.

**ماکوُز:** گیایەکە لە ئاوا دەڕوێ ئامالّ‌تاڵەو لە کوُزەڵە دەکا ف گیاهی است آبزی.

**ماکە:** ماك ف نگا: ماك.

**ماکەجوْ:** شێلەگە ف جای بریدن از جوی اصلی.

**ماکەر:** دێلەکەر ف مادەخر.

**ماکەلە:** مارەیی ف صداق.

**ماکەو:** کەوی مێ ف کبك ماده.

**ماکی:** ئەدی کێ؟ ف پس چه کسی؟.

**ماکینە:** ئامرازی دەسکرد بوْکارهاسان‌کردن، ماشێن ف ماشین.

**ماکینەچی:** ١) کەسێ کار بە ماکینە دەکا؛ ٢) خەیات، جلدرو بە چەرخ ف ١) تکنیسین؛ ٢) خیّاط.

**ماگ:** ١) ماو، نەمردو؛ ٢) لەبەین‌نەچوُگ ف ١) باقی، زنده؛ ٢) ازبین نرفته.

**ماگرت:** مراری، مرواری، گەوهەرێکە لەناو سەدەفدا ف مروارید.

**ماگرتە:** ١) پەڵەی ڕەشی ڕوی مانگ؛ ٢) مانگ‌گیران ف ١) لکەهای روی ماه؛ ٢) خسوف.

**ماگە:** ١) باقیماو؛ ٢) لەجێ‌ماو ف ١) باقیمانده؛ ٢) مانده.

**ماگیرسە:** مانگ‌گیران ف خسوف.

**مال:** ماڵ ف نگا: ماڵ.

**ماڵ:** ١) شتـی تایبـەتی کەسێ؛ ٢) دەوڵـەت‌و دارایی؛ ٣) کەل‌پەلی بازرگانی: (بـازرگانێك هاتـوە **ماڵی** هێنـاوە)؛ ۴) زێ، زێی حەیوانی مێچکـە؛ ۵) خانـو، جێ‌ژیانی خێزان؛ ۶) مابـەینی هەردوك سەری کەوان؛ ٧) مابـەینی دەنـدەو ئامـوُر؛ ٨) پاشگـری بەواتا: پێداهێن: (دەسمـاڵ)؛ ٩) پاشگـری بەواتـا: خاوێن‌کەرەوە؛ ١٠) ئامـرازی خاوێن‌کردنەوە: (**بەفرماڵ**)؛ ١١) دروسکەر: (**نمەدماڵ**، **خشت‌ماڵ**) ف ١) جزو دارایی؛ ٢) ثروت؛ ٣) کالای بازرگانـی؛ ۴) شرمگـاه حیوان مادینـه؛ ۵) خانـه، مسکن؛ ۶) فاصلۀ دوسر کمان؛ ٧) فاصلۀ میان گاواهن و خیش؛ ٨) پسوند به معنی مالنده؛ ٩) پسوند به معنی پاك‌کننده؛ ١٠) ابزار روبیدن و پاك کردن؛ ١١) سازنده.

**مالاّت:** ئاژڵ، وڵسات، حەیواناتی ڕاگرتن ف دام.

**مالاخمە:** کلوْشـی گێرەکراوی خەرمـان، خوْیان ف خـرمن کوبیدۀ بادنداده.

**مالار:** سێ‌پایەی مەشکە ف سەپایۀ مشك.

**مالاڤـا:** ١) سوپاس؛ ٢) خواحافیز؛ ٣) مروْی زەنگین‌و ماڵ‌خوْش؛ ۴) وتـەیەکـە بوْ سەرکوْنەی بەخوْشەویستیەوە دەیڵێن ف ١) سپاس؛ ٢) خداحافظ؛ ٣) متموّل، دارا؛ ۴) لفظ شماتت محبت‌آمیز.

**مالاڤایی:** خاترخوازی، خواحافیزی ف خداحافظی.

**مالاکا:** زەق‌تواشا، چاوەرپەڕیاگ، مولەقی‌چاو ف چشم برجستە.

**مالاکامەندش:** بەچاوی زەق ڕوانین ف خیرە نگریستن.

**مالامال:** دارماڵ، تژە ف مالامال.

**مالامن:** وشەیەکە لە جیاتی گیانەکەم ف جانا.

**مالامیر:** ۱) ناوچەیەکە لە کوردستان؛ ۲) کۆشکی خان ف ۱) ناحیەای در کردستان؛ ۲) قصر ارباب.

**ماڵان:** ۱) دانیشتوانی ئاوایی؛ ۲) جلك یان تێکوڵ فڕێدان. *لەگەڵ دا* ئێژن: (داماڵان) ف ۱) ساکنان آبادی؛ ۲) پوشش یا پوست انداختن.

**ماڵانگەڕ:** ژنێ کە هەمیشە سەر لە هەمو ماڵان دەدا ف زن ولگرد.

**ماڵانە:** باجی خانوان ف باج مستغلّات.

**ماڵاو:** ۱) پاڕوکراو، گەسك لێدراو؛ ۲) مشت و ماڵ کراو ف ۱) روبیده؛ ۲) مالیده.

**ماڵاوا:** وشەیەکە لە جیاتی خوداحافیز، خاترێ وە ف بدرود، خداحافظ.

**ماڵاوایی:** خواحافیزی، خاترخواستن ف خداحافظی.

**مالاهالی:** جا ئەوە حاڵە!؟، ئەمەش بوٌبە ژیان؟! ف لفظ شکایت از روزگار.

**مالبا:** خەمەگرۆ، سەرمازەلە، خومخموٚك ف سوسمار درشت.

**ماڵبات:** خاو، خێزان، خانەوادە ف اهل بیت، خانوادە.

**ماڵبڕ:** ۱) ئامرازی دەستی دزی ماڵان، دیواربڕ؛ ۲) دزێ کە دیوار کون دەکا ف ۱) ابزار دیوار سوراخ کردن دزد؛ ۲) دُزد.

**ماڵبڕی:** دزی لە ماڵان ف دزدی خانەها.

**ماڵبڕین:** ماڵبڕی ف دزدی خانەها.

**ماڵ بشکن:** ۱) گەڕان لە ماڵان بۆ شتێ؛ ۲) کەسێ کە ماڵان دەگەڕێ بۆ دۆزینەوەی شتێ ف ۱) تفتیش خانەها؛ ۲) مفتّش خانەها.

**ماڵ بشکێن:** ماڵ‌بشکن ف نگا: ماڵ‌بشکن.

**ماڵ بەماڵ:** ۱) گۆڕینەوەی کالا بە کالا؛ ۲) برێتی لە گشت خانوی ئاوایی: (**ماڵ بەماڵ** گەڕام) ف ۱) تهاتر، معاملۀ پایاپای؛ ۲) خانەبەخانە.

**ماڵبەند:** نیشتمان، جێ‌ماڵ‌و ژیان، بنکەی ماڵ ف مقرّ، موطن.

**ماڵپارێز:** ۱) ڕژد، چکوٚس، سەقیل، قرنیس؛ ۲) برێتی لە دەوڵەمەندی ترسەنۆك ف ۱) خسیس؛ ۲) کنایە از ثروتمندِ ترسو.

**ماڵپارێزی:** کار ماڵپارێز ف عمل «ماڵپارێز».

**ماڵ پشکن:** ماڵ‌بشکن ف نگا: ماڵ‌بشکن.

**ماڵ بشکێن:** ماڵ‌بشکن ف نگا: ماڵ‌بشکن.

**ماڵ تڤری:** ئامرازێ کە تەوەرەو بەرداشی سەرەوەی گرتوە لە ئاسیاودا ف ابزاری در آسیاب.

**ماڵتە:** ۱) هی تۆیە؛ ۲) وشەیەکی سەرکۆنەکردنە: (**ماڵتە تۆ بۆ هێندە توٌڕەی؟**) ف ۱) مال تو است؛ ۲) کلمۀ سرزنش.

**مالجۆ:** شەقەجۆ، جۆگەی سەرەکی ف جویبار.

**مالچرا:** گڕداپۆشی چرا، شیشەچرا ف شیشۀ چراغ.

**ماڵ خراب:** ۱) ماڵ‌وێران؛ ۲) بۆ لۆمە ئێژنی ف ۱) خانەخراب؛ ۲) لفظ شماتت.

**ماڵخۆ:** ۱) خاوەن، خێو؛ ۲) خاوەن‌ماڵ، خانەخوێ؛ ۳) خۆماڵی دژی بێگانە ف ۱) صاحب؛ ۲) خانەخدا؛ ۳) خودی، مقابل اَجنبی.

**مالخوٌێ:** ۱) خاوەن‌ماڵ؛ ۲) بریکار لە خەرج‌و مەزخاندندا ف ۱) صاحب خانە؛ ۲) وکیل خرج.

**مالخێ:** مالخوٌێ ف نگا: مالخوٌێ

**مالخەراب:** مال‌خراب ف نگا: مال‌خراب.

**ماڵدار:** ۱) دەوڵەمەند؛ ۲) ئاژەڵدار ف ۱) ثروتمند؛ ۲) دامدار.

**ماڵداری:** ۱) گردەوەکۆیی؛ ۲) کەیوانویی، ئاگاداری لە ماڵ؛ ۳) ئاژەڵداری ف ۱) صرفەجویی؛ ۲) خانەداری؛ ۳) دامداری.

**ماڵراو:** ۱) خاوێنەوەکراو؛ ۲) پێداساویاو ف ۱) روبیدە و تمیز شدە؛ ۲) ساییدەشدە بر.

**مالزەمە:** ئامیر، ئامرازی کار ف ابزارکار.

**ماڵسواری:** یەکسم ف مال‌سواری.

**ماڵشت:** ۱) دەس بەلەشا هێنان بە تەوژم، داماڵین؛ ۲) خاوێن‌کردنەوەی وڵات؛ ۳) مشت و ماڵ ف ۱) ماساژ؛ ۲) نظافت؛ ۳) صیقل.

**ماڵشتن:** کاری ماڵشت کردن ف کار «ماڵشت» کردن.

**ماڵشتە:** کەسێ کە ماڵشت دەکا ف «ماڵشت» کُن.

**مالشەوتی:** وشەیەکی سەرکۆنەیە ف از الفاظ شماتت.

**ماڵك:** ۱) ماڵی کەوان؛ ۲) خاوەن‌زەوی؛ ۳) کەردی پچوٌك بۆ سەوزی‌چاندن؛ ۴) کۆخ، کولێت، کۆختە؛ ۵) کونی شەش گۆشەی ناو شانەهەنگوین ف ۱) فاصلۀ کمان؛ ۲) ارباب، صاحب زمین؛ ۳) بیل کوچك باغبانی؛ ۴) کوخ، کلبە؛ ۵) هریك از شش‌ضلعی‌های کندوی عسل.

**ماڵك:** ۱) خانەخانەی چوارگۆشە؛ ۲) بەیتی شعر ف ۱) جدولِ مربّعات؛ ۲) بیت شعر.

**مال کامباخ:** چارەڕەش، بێچارە، بەدبەخت ف بیچارە.

**ماڵ کاول:** وشەیەکە بۆ لۆمەو سەرکۆنەکردن ف کلمۀ سرزنش.

**ماڵ کردن:** ۱) کەمێك بەلادا خوارکردنەوە؛ ۲) خانوٌ دروست‌کردن؛ ۳) برێتی لە ژن‌هێنان‌و خێزان‌دامەزراندن؛ ۴) جویێ‌بوٌنەوە لە خێزان‌و ماڵ: (**ماڵەخۆی کردوە**) ف ۱) متمایل کردن؛ ۲) خانەساختن؛ ۳) کنایە از متأهل شدن؛ ۴) جداشدن از خانوادە و مستقل شدن.

**ماڵکۆ:** دەسکی دۆڵ، دەسکی دینگی چەڵتوٌك‌کوتان ف دستۀ دنگ شالی‌کوبی.

**مالکەتن:** نابوٌت‌بوٌن، لەماڵ‌و دارایی بەش‌بڕان ف ورشکست شدن.

**مالکەتی:** نابوٌت ف ورشکست.

**ماڵگر:** ۱) کەسێ شتێ دەشارێتەوە بۆ گران‌بوٌن؛ ۲) کرانشین ف ۱) مُحتکر؛ ۲) اجارەنشین.

**ماڵگە:** خانوی کۆچەر لە ئاوایی کە تەنیا زستان تیا دەژی ف خانۀ ایلاتی در آبادی کە فقط زمستان در آن زندگی کنند.

**ماڵ لەیەك:** تێکماڵ، شەریك، برابەش ف شریك در ثروت.

**مالم:** پێش‌نوێژی جولەکان ف روحانی کلیمیان.

**مێنگە:** مێ، مێو ینە، ما، مان ف مادینە.
**مین مینك:** پەپوولە ف پروانە.
**مینە:** ١) مابەین، مینجا؛ ٢) سوکەڵەی حەمەدەمین، ناوە بۆ پیاوان؛ ٣) تۆژینـەوە، پشکنین، شی کردنەوە؛ ٤) گولێکە ف ١) وسط، میان؛ ٢) مخفف محمّدامین، اسم مردانە؛ ٣) پژوهش؛ ٤) نام گُلی است.
**مێنە:** پشت، پشتەوە ف پُشت بەطور عام.
**مینەق:** هێزی بەرگری لەئاپۆرە بۆ کاتی پێویست ف بسیج مردمی.
**مینەك:** باری ئازوخەو بژیوی کاروانچیو دەشتەوانان ف بار آذوقۀ کاروانیان.
**مێنە کە:** ئەنگوستیلەی بێ نقیم لە شاخەبزن ف انگشتر بی نگین از شاخ بُز.
**مینە گ:** وڵاخی سواریو بارەبەر ف حیوان سواری و باربر.
**مینەمۆکە:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان کە توسط بعثیان ویران شد.
**مینین:** وێك‌چوون، هاوشێوەیی، میناهی ف شباهت.
**مێو:** ١) مێ، ما، ماینـــە؛ ٢) شەم، شەمێ، مۆم؛ ٣) داری ترێ، ڕەز؛ ٤) بڕکەبێستان؛ ٥) دالووت، قایمەمێو کە داری مێو ی دەخرێتە سەر ف ١) مادینە؛ ٢) موم؛ ٣) تاك؛ ٤) بوتۀ چالیزی؛ ٥) داربستِ درخت مو.
**مێو:** نێوان، ناوەند ف مابین.
**میوان:** مەیمان، میرفان ف مهمان.
**مێوان:** میوان، مەیمان ف مهمان.
**میوانبەڕێ کردن:** ١) بـاش‌بـەخـێـوکـردنـی مـەیمـان؛ ٢) مەیمان‌خستنەسەرڕێ بۆ ڕۆیشتن ف ١) پذیرایی کردن از مهمان؛ ٢) مهمان را بدرقە کردن.
**میوانخـانـە:** ١) دیوەخانی میوانان؛ ٢) جێگەی شەومانەوەی میوانان بەکرێ ف ١) اتاق مهمانان، اتاق پذیرایی؛ ٢) مسافرخانە.
**مێوانخانە:** میوانخانە ف نگا: میوانخانە.
**میواندار:** کەسێ کە زۆری مەیمان هەیەو مەیمان زۆر ڕادەگرێ ف کسی کە بسیار مهمان دارد، مهمان‌پذیر.
**میوانداری:** پەزیرایی لە مەیمان ف پذیرایی از مهمان.
**میوانداکردن:** مەیمان‌ڕاگرتن، ڕێگەدانی مەیمان بۆ ناو ماڵ ف مهمان پذیرفتن.
**میوانڕاگرتن:** میوان‌داکردن ف مهمان پذیرفتن.
**میوانەوین:** میوان‌دۆست ف مهمان‌دوست.
**میوانی:** ١) مەیمانی؛ ٢) میڤانی، چێشتی ئاردو ڕۆن ف ١) مهمانی؛ ٢) کاچی.
**مێودان:** گشتەك دەمۆم‌ساوین ف رشتە را موم اندودکردن.
**مێوڕۆن:** مەڵحەمێکی بەپێستاساوینە ف روغن و موم، مرهمی است.
**مێوژ:** ترێی لەبەرتاو ئیشکەوەکراو ف مویز.
**مێوژۆکـە:** ١) لکی داری داردەموکانە: (وەك مێوژۆکە دەلەرزێ)؛ ٢) بنی گیایەکە بەقەدگێوژ زارۆ دیخۆن ف ١) شاخۀ درختچۀ مویزك؛ ٢) ریشۀ خوردنی نوعی گیاە.

**مێوژە:** گونـدێکـە لە کوردستـان بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدۀ کردستان توسط بعثیان.
**مێوك:** دوگمە، قۆپچە، بشکۆژ ف دکمە.
**مێوگرتن:** بەرگی مۆم دەبەر دوعای نوسراو کردن ف موم اندودکردن.
**مێولانە:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان کە توسط بعثیان ویران شد.
**مێولەسەر:** جۆرێ فیشەك ف نوعی فشنگ قدیمی.
**میون:** مێو، ناوەند، دوڕ ف مابین.
**مێونێ:** گونـدێکی کوردستـانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان کە توسط بعثیان ویران شد.
**میوە:** بەری تام‌خۆشی دارو بێستان ف میوە.
**مێوە:** ١) میوە، فێقی؛ ٢) ما، ماینە، جووتی نێر ف ١) میوە؛ ٢) مادینە جفت‌نرینە.
**میوەجات:** گەلەك‌جۆری فێقی ف میوەجات.
**مێوەرد:** تۆم‌چاندن دوای هەوەڵ‌بارانی پایز ف کاشت بعد از اوّلین باران پائیزی.
**مێوەڕۆن:** مێوڕۆن ف نگا: مێوڕۆن.
**مێوژەڵ:** مێورە ف شاخۀ هرس شدۀ تاك.
**میوەك:** شۆڕەوەبووگ، دالەقاو ف آویزان.
**میوە گەنان:** مانگی ڕەزبەر ف مهرماە.
**مێوەلە:** ما، مێ، مێوە ف مادینە.
**مێوەمارانە:** جۆرێ کاڵەکەمارانەیە ف نوعی هندوانۀ ابوجهل.
**میوەهات:** میوەجات ف میوەجات.
**مێوین:** لە مێو چێ‌کری ف ساختە از موم.
**مێوینە:** ١) ماینە، ما، مێ، جووتی نێر؛ ٢) مشەمای مێودراو ف ١) مادینە، جفت نر؛ ٢) مشمّع.
**مێهـ:** مەڕ، پەز، مەڕەزاو ف میش، گوسفند.
**مێهتن:** مژتن، مژین ف مکیدن.
**میهرەبان:** دڵنەرم ف مهربان.
**میهرەوان:** میهرەبان ف مهربان.
**میهڤان:** میوان، مەیمان ف مهمان.
**میهڤان‌خودانکرن:** مێوانداری کردن، میوان‌ڕاگرتن ف پذیرایی کردن از مهمان.
**میهڤان‌دۆست:** کەسێ کە بەمیوانان حەزدەکا ف مهماندوست.
**میهڤان‌ڕێکرن:** میهڤان‌خودانکرن ف پذیرایی کردن از مهمان.
**میهڤانی:** مەیمانی ف مهمانی.
**میهمان:** میڤان ف مهمان.
**میهمانخانە:** میوانخانە ف نگا: میوانخانە.
**میهمـانـدار:** ١) میوانـدار؛ ٢) ناوی گونـدێکـە لە کوردستـان ف ١) مهمان‌پذیر؛ ٢) نام روستایی است.
**میهمانی:** مەیمانی ف مهمانی.
**میهمۆز:** مامزە، ئاسنی لای پاژنەی سوار ف مهمیز.

**میەر:** پەز، مەڕ، مێ ف گوسفند.
**میەو:** دەنگی پشیلە، میاو ف صدای گربە.
**میهەنگ:** ۱) عەیار، پێوانە؛ ۲) ئەندازەشاندەر ف ۱) پیمانە؛ ۲) درجە، عقربە.
**میین:** مهین ف نگا: مهین.
**مێینە:** مێوینە، مێ، مێوە ف مادینە.
**مێیە:** ۱) مێینە، جوتی نێرە: (ئەم کۆترە مێیەی ئەونێرەیە)؛ ۲) ئاڵقەی قرتە ف ۱) مادینە، جفت نرینە؛ ۲) حلقۀ سگک.
**مێیینە:** مێوینە، بەرانبەری نێرینە ف مادینە، مخالف نرینە.

**ن:** ١) پاشگری کۆمەڵ بۆ ئەوانەی دەدوێندرێن: (**بخۆن، بچن**)؛ ٢) پاشگری بەواتا: ئێمە: (**بۆن** بێنە، **لێن** گەڕێ)؛ ٣) پاشگری پەسنی ناحەز: (**چڵکن، چڵمن، کوڵکن**)؛ ٤) پاشگری ماكو کەرستە: (**زێڕن**)؛ ٥) پاشگری خەبەر لەکۆمەڵدان: (**هاتن، دەچن، دەڕۆن**)؛ ٦) پاشگری پاڵدان: (**پاشن**)؛ ٧) پاشگری چاوگە: (**کرن، برن**)؛ ٨) نە، نا: (**ئەز نزانم**) ف ١) پسوند جمع مخاطب؛ ٢) پسوند متکلّم مع الغیر؛ ٣) پسوند توصیف؛ ٤) پسوند نسبت؛ ٥) خبر از سوم شخص جمع؛ ٦) پسوند اتّکا؛ ٧) پسوند مصدری، علامت مصدر؛ ٨) نە، حرف نفی.

**نا:** ١) بێ: (**ناهومێد**)؛ ٢) دوورەپەرێزی: (**ناچم، ناخۆم**)؛ ٣) دوڵاش: (سەر **نای** ئاسیاو)؛ ٤) وشەی پرسیار: (تۆ چو یە شار **نا**؟)؛ ٥) ئان، یان: (**نا** تۆ بچو **نا** من دەچم)؛ ٦) وشەی حاشا: (تۆ خواردت؟ **نا**) ف ١) بدون؛ ٢) نە؛ ٣) ناوآسیاب؛ ٤) کلمهٔ پرسش؛ ٥) یا؛ ٦) کلمهٔ حاشا، انکار.

**نائاسایی:** بەدەر لە دامو دەستوور ف غیرعادی.

**نائومێد:** بەئاوات نەگەیشتو ف نومید.

**نائەمین:** ١) غاین، خەیان، دەستپیس؛ ٢) بقە، خەتەر ف ١) غیرقابل اعتماد، نامطمئن، نادرست؛ ٢) خطرناك.

**نابا:** ١) شتێ کە کەم دەس دەکەوێ؛ ٢) تیا جێگەی نابێتەوە: (ئەم جەواڵە ئەم گەنمە **نابا**)؛ ٣) توانای نیە: (ئەم کەرە بارەکەی **نابا**)؛ ٤) نایوات، نایبا ف ١) نایاب؛ ٢) نمی‌گنجد؛ ٣) توانایی ندارد؛ ٤) نمی‌برد.

**ناباب:** ناباو ف ناباب.

**نابالغ:** منالی هێشتا گەورە نەبووگ ف نابالغ.

**نابالق:** نابالغ، نەگەیوەتە بلوق ف نابالغ.

**نابـاو:** ١) بێ بڕەو، بێ ڕەمێن؛ ٢) دوور لە داب و دەستووری کۆمەڵ ف ١) بی‌رواج؛ ٢) ناباب و غیرعادی.

**نابایس:** لە پێویست بە دوور ف نابایستە.

**نابوو:** لە دارایی کەفتگ ف ورشکست.

**نابووت:** ١) نابوو؛ ٢) پووتە، پووتەکە ف ١) ورشکست؛ ٢) کوتاه قدّبدقوارە.

**نابووتبوون:** لەدارایی کەوتن ف ورشکست شدن.

**نابووتە:** پووتەکە، پیسەکە، قرخنە ف کوتاه‌قدّ لاغر بدقوارە.

**نابـووتی:** ١) لەدارایی کەوتن؛ ٢) پووتـەکـەیی ف ١) ورشکستگی؛ ٢) بدریختی و کوچك اندامی.

**نابوود:** نابووت ف نگا: نابووت.

**نابووینك:** تیرۆکی ئەستووری ئەنگوتك‌پان‌کردنەوە، وەردێنە ف نورد نانوایی.

**نابوویی:** نابووتی، لەدارایی کەفتن ف ورشکستگی.

**نابە:** ڕەوانیە، نابێ، ناشێ: (**ولۆ نابە**) ف سزاوار نیست.

**نابەجا:** پێچەوانەی ڕێوشوێنی ئاسایی ف نامعقول.

**نابەجێ:** نابەجا: (بەجێ‌ماوم لە یاران **نابەجێ** ماوم ئەجەل زووبە/ بە مردن لەم قسووری ژینە ئیستیعفا نەکەم چبکەم؟) «مەحوی» ف نامعقول، نابجا.

**نابەحەق:** پێچەوانەی حەق و ڕاستی ف ناروا.

**نابەدڵ:** پێچەوانەی دڵخواز، شتێ کە پەسند نەکرێ و بەردڵ نەکەوێ ف برخلاف میل.

**نابەکار:** بەدکار، زاڵم ف بدکار.

**نابەکام:** بەمراد نەگەیشتگ ف ناکام.

**نابەڵەد:** پێچەوانەی شارەزا ف ناوارد.

**نابەڵەگ:** نابەڵەد ف ناوارد.

**نابەڵەڵ:** نابەڵەد ف ناوارد.

**نابەوەخت:** بێ‌وەخت ف نابهنگام.

**نابەین:** دوڕ، مابەین ف میان، وسْط.

**نابێ:** ناشێ ف نمی‌شود.

**نابینك:** نابووینك ف وردنهٔ نانوایی.

**ناپارازی:** خۆتزیك‌کردن لە شتێ کە ئەبێ لێی دووربی ف بی‌احتیاطی.

**ناپارێزی:** ناپارازی، لە خەتەر دووری نەکردن ف ناپرهیزی، بی‌احتیاطی.

**ناپاك:** ١) پیس، گەمار، چڵکن؛ ٢) بەدفەڕ، خاین ف ١) ناپاك؛ ٢) خائن.

**ناپـوخت:** ١) پیس و پۆخـڵ؛ ٢) کاربـڵاو: (کاری هەر **ناپوختە**) ف ١)

کثیف؛ ۲) ناپخته، نامنظّم.

**ناپەسن:** شتێ کە لە بەردڵ‌کەوتن دوُرە ف ناپسند.

**ناپەسند:** ناپەسن ف ناپسند.

**ناپەسەن:** ناپەسن ف ناپسند.

**ناپەسەند:** ناپەسن ف ناپسند.

**ناپیاو:** کەسێ کە لە مەردایەتی بێ‌بەشە ف نامرد.

**ناپیاوەتی:** پێچەوانەی مەردایەتی ف نامردی.

**ناپیاوی:** ناپیاوەتی ف نامردی.

**نات:** لەم‌لاوە ف از این طرف.

**ناتا:** نات، لەیرەوە ف از این طرف.

**ناتانم:** لە توانام بەدەرە ف نتوانم

**ناتانین:** ۱) بێ‌تاقەت‌بوُن لە ئەنجامی کارێکا؛ ۲) ئێمە بۆمان ناکرێ ف ۱) نتوانستن؛ ۲) نمی‌توانیم.

**ناتاو:** کەم‌و کوُڕ، هێشتا بۆ پوخت‌بوُن دەیەوێ ف نادرست، ناپخت، ناتمام.

**ناتاوان:** بێ‌گوناە، بێ‌تاوان ف بی گناه.

**ناتاوی:** کەم‌و کوُڕی، بەدوُر لە پوختی‌و دروستی ف نقص، کاستی.

**نات‌دوت:** ئێرو ئەوێ ف اینجا و آنجا.

**ناتر:** دەللاك، کیسەکێشی حەمام ف دلّاك حمّام.

**ناترا:** لێرەوە ف از این طرف.

**ناترە:** شادە، شارە، عەلامەتی نێوان کاو گەنم لە خەرمان ف چوبکهای فاصل کاه و گندم در خرمن.

**ناتف:** گشتەکی برین‌دروُن ف نخ بخیهٔ جرّاحی، رشتهٔ زخم‌دوزی.

**ناتوا:** پێچەوانەی دەخوازێ ف نمی‌خواهد.

**نات‌واتا:** لێرەولەوێ ف اینجا و آنجا.

**ناتوام:** پێچەوانەی دەمەوێ ف نمی‌خواهم.

**ناتـــواو:** ۱) پەرێشـــان‌حاڵ، پەشـــێو؛ ۲) پێچـــەوانـــەی تەواو ف ۱) پریشان‌حال؛ ۲) ناتمام.

**ناتوای:** پێچەوانەی دەتەوێ ف نمی‌خواهی.

**ناتۆر:** باغەوان ف باغبان.

**ناتۆرە:** لەقەمی ناپەسند ف لقب زشت.

**ناتەبا:** پێچەوانەی ئاشت‌و مابەین‌خۆش ف ناسازگار.

**ناتەبایی:** مابەین‌تێکچوُیی ف ناسازگاری.

**ناتەمیز:** پیس، چڵکن، گەمار ف کثیف.

**ناتەمیس:** ناتەمیز ف کثیف.

**ناتەوان:** بێ‌تاقەت، بێ‌تین‌و تابشت ف ناتوان.

**ناتەواو:** ناتواو ف ناتمام.

**ناجایز:** نابەحەق ف ناروا.

**ناجسن:** ۱) بەدفـەڕ، ناپـەسنـد؛ ۲) رەگەزچروُك، بنیچەخوێری ف ۱) بدادا، بدجنس؛ ۲) نانجیب.

**ناجۆر:** ۱) ناباو؛ ۲) دژی رێك‌وپێك ف ۱) ناباب؛ ۲) نامرتّب.

**ناجوُر:** ناباو ف نگا: ناباو.

**ناجەستە:** پوُتەکە، نابوُت ف بی‌نمود، کوتاه‌قدّ بدریخت.

**ناجەسە:** ناجەستە ف نگا: ناجەستە.

**ناجیح:** سەرکەوتو لە کاری خۆی‌دا ف موفّق در کار.

**ناچاخ:** بێ‌کەیف ف بی‌حال، نزار.

**ناچار:** مەجبوُر، کەسێ کە دەسەڵاتی کاری بەخۆی نەبێ ف ناگزیر.

**ناچم:** ۱) ڕۆیشتن ناکەم، بەرانبەری دەچم؛ ۲) بەرانبەری دەشبێم ف ۱) نمی‌روم؛ ۲) شباهت ندارم.

**ناچن:** ۱) پێچەوانەی دەچن؛ ۲) پێچەوانەی دەشبێن ف ۱) نمی‌روند؛ ۲) شباهت ندارند.

**ناچە:** کوُژە، گەروُلەی ئاش ف گلوی آسیا که گندم از آن ریزد.

**ناچەخ:** تەوری دەستی شەڕکەران لە پێشودا ف تبردست جنگاوران قدیم.

**ناچێ:** ۱) پێچـەوانەی دەڕوا؛ ۲) پێچەوانەی دەشبێ، لەگوێنی نەو نیە: (کاکت وەك تۆ **ناچێ**)؛ ۳) بەخت ناکرێ، برەوی نیە: (ئەم پارەقەڵبە **ناچێ**) ف ۱) نمی‌رود؛ ۲) شباهت ندارد؛ ۳) رواج ندارد، رایج نیست.

**ناچیز:** خوێڕی، ناجسن ف بی‌همه‌چیز.

**ناچیزە:** ژنێ کە لە فەرمانی شوُ سەرپێچی دەکا ف زن ناشزه.

**ناچین:** ۱) پێچـەوانەی دەچین؛ ۲) بێ‌شباندن بە یەکترین: (ئێمە وەك یەك **ناچین**) ف ۱) نمی‌رویم؛ ۲) بی‌شباهتیم.

**ناحاواو:** ۱) بزۆز، بێ‌ئارام؛ ۲) کەسێ کە لە سازان‌و تەبایی دڕدۆنگە ف ۱) عجول، ناآرام؛ ۲) ناسازگار.

**ناحەز:** ۱) بێ‌بەش لە جوانی‌و خوشیکی؛ ۲) دوژمن ف ۱) نازیبا؛ ۲) دشمن.

**ناحەزی:** ۱) بێ‌بەشی لە جوانی؛ ۲) دوژمنایەتی ف ۱) بدگلی؛ ۲) دشمنی.

**ناحەساو:** ۱) سەرجەوت؛ ۲) قسەی نابەجێ ف ۱) بدحساب؛ ۲) سخن نامقبول.

**ناحـەسـاوی:** ۱) سەرچەوتی؛ ۲) قسەی بێ‌جێ ف ۱) بدحسابی؛ ۲) سخن لاطایل.

**ناحەسڵ:** رەسەن‌خراو، ناجسن ف بدگهر.

**ناحەسێ:** بە ئاگا نایە ف احساس نمی‌کند.

**ناحەسێبی:** ناحەساوی ف نگا: ناحەساوی.

**ناحەسێتەوە:** لە ئاسوُدەیی بێ‌بەشە ف نیاساید.

**ناحەسێوی:** ناحەساوی ف نگا: ناحەساوی.

**ناحەق:** پێچەوانەی حەق‌و ڕەوا، زوڵم ف ناروا.

**ناحەقی:** زوڵم ف ستم.

**ناحەونێ:** بە هیچی دانانێ ف به هیچ نمی‌شمارد.

**ناحیە:** مەڵبەند، بەشێ لە سەرزەمینی چەند ئاوایی ف ناحیه، منطقه.

**ناخ:** ۱) ژوُرەوەی هەرشتێ، ناوەڕۆك: (بـە **ناخی** عەرزا چو)؛ ۲) جێگە، لان؛ ۳) دەریای زل ف ۱) ناف، عُمق، درون؛ ۲) جای؛ ۳) دریای مُحیط

**ناخا:** بەزەویدا نادا، پێچەوانەی فڕێ دەدا: (بارەکە **ناخا**) ف نمی‌اندازد.

**ناخار:** ۱) زبرو بەکەندو کلۆ؛ ۲) بەدفەڕ، شەڕهەڵایسێن؛ ۳) تیخی زۆر باش، ناغار ف ۱) ناتراشیده، ناهموار؛ ۲) شرور؛ ۳) تیغ بسیار خوب.

**ناخازم:** ناتوام ف نمی‌خواهم.

**ناخافڵ:** بێ‌ئاگاداری، لەپڕ، کتوپڕ ف ناگهان.

**ناخر:** ۱) ڕەوەی شەو بەکێو؛ ۲) گاگەل، گاران؛ ۳) شوانی گاوان ف ۱) رمه‌ای که شب در صحرا می‌ماند؛ ۲) گلهٔ گاوان؛ ۳) چوپان گاوان.

**ناخرقـەوان:** دەڕۆژەی ئاخری سەرماوەز کە ڕەوە دەکرێتەژوورەوە ف ده روزهٔ آخر آذرماه.

**ناخلاف:** کتوپڕ، لەپڕ ف غفلتاً، ناگهان.

**ناخو:** ماکێکی سەخت‌و بریقەدارە بە پشتی قامکەوە، چنجرۆکی بنیادەم ف ناخن.

**ناخۆ:** ۱) هەتاوابێ؛ ۲) کەوایە؛ ۳) ئەی‌چۆن؟ ف ۱) تا چنین است؛ ۲) که اینطور؛ ۳) چطورمگر؟.

**ناخوا:** ۱) گەمیەوان؛ ۲) لە خواردن بەپارێزە ف ۱) ناخدا؛ ۲) نمی‌خورد.

**ناخودا:** ۱) گەمیەوان؛ ۲) گوناحبارو بێ‌ترس لە خودا ف ۱) ناخدا؛ ۲) خدانشناس.

**ناخۆرا:** کەم‌خۆر ف کم‌خوراك.

**ناخۆرە:** زەمینی قوپاو، عەرزی ڕۆچوگ ف زمین فرورفته.

**ناخوری:** ۱) نۆبەرەی فرزەند؛ ۲) نۆبەرەی میوە ف ۱) فرزند نوباوه؛ ۲) نوبر میوه.

**ناخـۆش:** ۱) لەش‌بەبار؛ ۲) چێژەناپەسند؛ ۳) هەوای تۆش؛ ۴) ناتەبا: (مابەین **ناخۆش**) ف ۱) بیمار؛ ۲) بدطعم؛ ۳) هوای بد؛ ۴) میانهٔ بد، شکراب.

**ناخـۆشی:** ۱) تەڕو تۆشی کەش؛ ۲) لەش‌بەباری؛ ۳) ناتەبایی ف ۱) موسم سرما و بارش؛ ۲) بیماری؛ ۳) ناسازگاری.

**ناخۆشین:** بێماری، لەش‌بەباری ف بیماری.

**ناخون:** ناخو ف ناخن.

**ناخوندە:** نەخوێندەوار ف بیسواد.

**ناخون‌شەیتان:** شەیتانۆکە ف حلزون.

**ناخـونـە:** ۱) لەکەی باریك‌و سوور کە لە چاو بەیدا دەبێ، نەخۆشیەکی چاوە؛ ۲) پرزەی دەوری تەون کە پۆی تێوە نادرێ ف ۱) از بیماریهای چشم؛ ۲) تار بی‌پود در کنارهٔ بافت.

**ناخونەك:** ۱) خواردن لە شتێ بە بێ ئیجازەی خاوەنی؛ ۲) ناخونەی چاو ف ۱) خوردن از چیزی بدون اجازه، ناخنك؛ ۲) از بیماریهای چشم، نگا: ناخونه.

**ناخویا:** بەرپیوار، لەبەرچاوگوم ف ناپیدا.

**ناخوێنە:** لەکەی سووری چاو، ناخونە ف لکهٔ قرمز چشم، نوعی بیماری.

**ناخەفم:** دەخەوڕاناچم ف نمی‌خوابم.

**ناخەڵەف:** منالّی خراپ ف فرزند ناخلف.

**ناخەوم:** ناخەفم ف نمی‌خوابم.

**ناخێر:** ۱) نا. پێچـەوانـەی ئارێ؛ ۲) هیچ‌و پوچ‌و بێ‌بەهـرە: (بە گیانی ناخێرت نەچوی) ف ۱) نه؛ ۲) بی‌بهره‌و هرزه.

**نادا:** پێچەوانەی دەدا، نابەخشێ ف نمی‌دهد.

**نادان:** ۱) ڕژد، دەس‌قوچاو، چرۆك؛ ۲) پەژیوانی ف ۱) خسیس؛ ۲) پشیمانی.

**نادر:** ۱) کەم‌تا، کەم‌وێنە؛ ۲) ناوە بۆ پیاوان ف ۱) کم‌نظیر؛ ۲) نام مردانه.

**نادروس:** ۱) پیاوی چەوت‌و خوار؛ ۲) نابەجێ ف ۱) آدم نادرست؛ ۲) ناروا.

**نادروست:** نادروس ف نگا: نادروس.

**نادم:** نابەخشم ف نمی‌دهم.

**نادۆ:** سوکەلەناوی نادر، ناوی پیاوانە ف مخفّف نادر.

**نادۆك:** داری سێ‌پای مەشکە ف چوب سه‌پایهٔ مشك.

**نادۆڵ:** کوژە، گەروڵەی ئاش ف گلوی آسیاب که گندم از آن ریزد.

**نادوێ:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی درکردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**نادە:** ۱) میوەیێ کە زوو پێ‌بگا؛ ۲) کارێ کە هاسان‌و زوو پێك‌بێت ف ۱) زودرس؛ ۲) کاری که انجام دادنش زیاد وقت نمی‌خواهد.

**نادەت:** نادا ف نمی‌دهد.

**نادەتن:** نادا ف نمی‌دهد.

**نادەم:** پێچەوانەی دەبەخشم ف نمی‌دهم.

**نادی:** ۱) نادەی؛ ۲) جێگـەی پشـودان‌و ئیسـراحـەتی دۆستان ف ۱) نمی‌دهی؛ ۲) باشگاه.

**نادیار:** بەرپیوار، ناخویا ف ناپیدا.

**نادیاری:** نادیار ف ناپیدا.

**نادەیەنە:** ڕوانین، نواڕین، تواشاکردن ف نگاه کردن.

**نادینێ:** نابینێ، لەدیتنێ بێ‌بەشە ف نمی‌بیند.

**نادێنێ:** دەڕوانێ، تواشادەکا ف نگاه می‌کند.

**نار:** میوەیەکـە پاییزی قاپێلك‌خڕ زۆری دەنـك تێدایە ترش‌و شیرن‌و مێخۆشی هەیە، هەنار: (**روبەنار**) ف انار.

**نارا:** ۱) ئێستە، ئایسە؛ ۲) هەر ئەم‌جارە ف ۱) اکنون؛ ۲) فقط این دفعه.

**ناڕاس:** چەوت، خوار ف ناراست.

**ناڕاست:** ناڕاس ف ناراست.

**ناڕاستی:** چەفتی، لاری ف ناراستی، نادرستی.

**ناڕاسی:** ناڕاستی ف نادرستی.

**ناراو:** ۱) ژەهراو؛ ۲) بەڵاو بەدبەختی؛ ۳) ڕەوانەکراو، بەڕێ‌کراو ف ۱) زهرابه؛ ۲) مصیبت و بدبختی؛ ۳) فرستاده.

**نارای:** نارا ف نگا: نارا.

**نارِبە:** پشکوتنی گەڵاو لکی ڕوەك ف شکفتن و جوانه‌زدن گیاه.

**نارِبەند:** دارەبی ئێختەکراو ف درخت بید اخته‌شده.

**نارجـەلانجـوخ:** گونـدێکـە لە کوردستـان بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**نارجیل:** جۆرە دەنکەتەزبیحێکە ف نوعی دانهٔ تسبیح.

**ناردانی:** پەیژە، سلەم، نەردیوان، ناردیوان ف نردبام.

**ناردت:** ١) رەوانەت‌كرد؛ ٢) رات‌سپارد ف ١) فرستادی؛ ٢) سفارش كردی.

**ناردراو:** رەوانەكراو، ناراو ف فرستاده.

**ناردم:** ١) رەوانەم‌كرد؛ ٢) رام‌سپارد ف ١) فرستادم؛ ٢) سفارش كردم.

**ناردن:** ١) رەوانەكردن؛ ٢) راسپاردن ف ١) فرستادن؛ ٢) سفارش كردن.

**ناردی:** ١) رەوانەی كرد؛ ٢) ڕای‌سپارد ف ١) فرستاد؛ ٢) سفارش كرد.

**ناردين:** جەگەن، گیاحەسیر ف گیاه حصیر بافی.

**ناردیوان:** پەیژە، سلەم ف نردبام.

**نارگیله:** قلیان‌ئاوی ف قلیان.

**نارێن:** ناچن، پێچەوانەی دەڕۆن ف نمی‌روند.

**نارناروكه:** قامێكه ف ترانه‌ایست.

**نارناروكێ:** نارناروكه ف ترانه‌ایست.

**نارنج:** میوەیەكه لە تیرەی پرتەقاڵ و لالەنگی و كەبات ف نارنج.

**نارنجوك:** بۆمبای چكۆڵەی دەستی ف نارنجك.

**نارنجەك:** نارنجوك ف نارنجك.

**نارنجەڵە:** لەو گوندانەی كوردستانە كە بەعسی كاولیان كرد ف روستایی در كردستان كه بعثیان آن را ویران كردند.

**نارنجی:** بەڕەنگی نارنج ف نارنجی رنگ.

**نارنگی:** لالەنگی ف نارنگی.

**ناروجە:** گوندێكە لە كوردستان بەعسی وێرانی كرد ف از روستاهای ویران شدهٔ كردستان توسط بعثیان.

**ناروژ:** ئەمڕۆ، ئیمڕۆ ف امروز.

**ناروك:** جۆرێ میوەی ناری ناپەسندو پچوك ف نوعی انار كوچك و نامرغوب.

**ناروكه:** قامێكه ف ترانه‌ایست.

**ناروەند:** دارەڕەش، دارێكی بێ‌بەرە قەدی ڕەشەو لك و پۆپی جوانی هەیە ف نارون.

**ناره:** گوڕە، نەعرەتە، گوڕین بەدەنگی بەرز ف نعره، غُرّش.

**نارەت:** ناچێ ف نمی‌رود.

**نارەتە:** گوڕە، گوڕین بە دەنگی بەرز ف نعره.

**نارەحەت:** ١) لە ئاسوودەیی بێ‌بەش؛ ٢) جاڕز، قەڵس؛ ٣) ڕق‌هەستاو، توڕە؛ ٤) زۆر نەخۆش ف ١) ناراحت؛ ٢) پكر؛ ٣) خشمگین؛ ٤) بسیار بیمار.

**نارەزا:** كەسێ كە شتێ قبوڵ نەكا ف ناراضی.

**نارەزایی:** توڕەیی و قەڵسی ف ناخشنودی.

**نارەسەن:** ناجسن، ناحەسڵ ف بدگهر.

**نارەنار:** گۆرانی لەسەرخۆ و لەبەرخۆوە، لۆرەلۆر ف زمزمه، ترنّم.

**نارەوا:** ١) ناحەق، نابەجێ؛ ٢) سكەی قەڵب ف ١) ناروا؛ ٢) سكّهٔ تقلّبی.

**نارەوان:** ١) لەبەرنەكراوی دەرس؛ ٢) خوێندنەوەی بە گرێ و گۆڵ؛ ٣) زمانێ كە لە قسەدا ڕەت دەبا ف ١) ازبر نشده؛ ٢) روخوانی با اشكال؛ ٣) زبان لكنت‌دار.

**نارەوایی:** نابەجێ‌بوون ف نارَوایی.

**نارەوەن:** نارەوەند ف درخت نارون.

**ناری:** ١) پێچەوانەی باری، نەهێنی؛ ٢) نازناوی شاعیرێكی ئەم چەرخە ف ١) نیاوری؛ ٢) تخلّص شاعری كردزبان و معاصر.

**نارێ:** ١) ناوی ژنانە؛ ٢) قامێكه ف ١) نام زنانه؛ ٢) ترانه‌ایست.

**نارياگ:** ١) ناردراو؛ ٢) ناراو، راسپێراو ف ١) فرستاده؛ ٢) سفارش شده.

**ناریعەلی:** زۆر بەدژواری: (بە هەزار **ناریعەلی** قەرزەكەم لێ‌ساند) ف كنایه از زحمت زیاد.

**نارێك:** ١) ناجۆر؛ ٢) دژی تەكوز؛ ٣) دژی تەخت و ساف ف ١) ناجور؛ ٢) نامرتّب؛ ٣) ناهموار.

**نارین:** ١) گۆرانی خەمبارانە؛ ٢) ناوی ژنانە؛ ٣) ژنی شەرمن؛ ٤) ناسك، تەنك ف ١) آهنگ حزین؛ ٢) نام زنانه؛ ٣) زن خجالتی؛ ٤) نازك و تُنُك.

**ناز:** ١) عیشوە، گریشمە؛ ٢) داری سنۆبەر؛ ٣) خۆشەویستی، دلۆڤانی ف ١) ناز؛ ٢) درخت صنوبر؛ ٣) محبت، مهربانی.

**نازار:** خۆشەویست، زۆر خۆشەویست ف نازنین.

**نازاڤ:** تێراو، تورت‌وشەق ف شاداب.

**نازاو:** ١) نازاڤ؛ ٢) لەبەر زۆر ئاودان زەردبووگ ف ١) شاداب؛ ٢) از كثرت آب دادن زرد شده.

**نازبالنج:** بالگەهی سقك و بچوك ف نازبالش.

**نازپەروەر:** بە خۆشەویستی گەورەكراو ف نازپرورده.

**نازپێوەكردن:** شانازی‌پێ‌كردن ف افتخار به كسی كردن.

**نازدار:** ١) نازار؛ ٢) ناوی ژنانە ف ١) محبوب، نازنین؛ ٢) نام زنانه.

**نازداری:** خاوەن‌نازی ف نازنینی.

**نازرینگ:** حۆل و گێل، كەم‌فام ف كَودَن.

**نازشێوان:** لەسەر خۆشیانەوە تووشی خەم و مەینەت بوون ف از خوشی به ناخوشی افتادن.

**نازفرۆشتن:** عیشوەو قەمزە كردن ف نازكردن.

**نازك:** ١) پێچەوانەی سەخت، نەرم؛ ٢) وردو باریك؛ ٣) تورت ف ١) نرم؛ ٢) ظریف، نازك؛ ٣) تُرد.

**نازكردن:** نازفرۆشتن ف نازكردن.

**نازككار:** ١) بەنایێ كە گوڵبڕی بە گەچ لە خانوان دەكا؛ ٢) دارتاشی كاری وردەكاری ف ١) گچ‌بر؛ ٢) نازك‌كار چوب.

**نازككاری:** كاری نازككار ف ١) گچ‌بری؛ ٢) نازك‌كاری بر چوب.

**نازكەر:** نازفرۆش ف عشوه‌گر.

**نازكەش:** خەم‌خۆر و نازقبوڵكەر لە خاوەن‌ناز ف نازكش.

**نازكەك:** لەش‌نازك ف نازك اندام.

**نازكەی:** نازكی ف نگا: نازكی.

**نازكی:** ١) نەرمی؛ ٢) تورتی؛ ٣) باریكی ف ١) نرمی؛ ٢) تردی؛ ٣) نازكی.

**نازكێش:** دڵسۆز، خەمخۆر، دڵبڕ لە بەزەیی بۆ ژێردەستی خۆی ف

سرپرست غمخواره.

**نازکێشان:** خەمخۆری‌و دڵسۆزی دەگەڵ ژێردەستە ف سرپرستی و غمخوارگی.

**نازگ:** نازك ف نگا: نازك.

**نازلی:** ۱) نازدار؛ ۲) قامیکـــە؛ ۳) ناوی ژنـــانـــە ف ۱) نازنین؛ ۲) ترانه‌ایست؛ ۳) نام زنانه.

**نازم:** ۱) سەرپەرستی مەکتەب؛ ۲) ناوی پیاوانە ف ۱) ناظم مدرسه؛ ۲) نام مردانه.

**نازمیا:** ناوچەیەکە لە کوردستانی بەردەستی ترکان ف منطقه‌ای در کردستان.

**نازناز:** گوڵێکە بەزۆر ڕەنگان ف گل نازناز.

**نازناو:** لەقەمی باشی هەڵبژێراو ف لقب برگزیده.

**نازونوز:** نازکردن بە مینگەو فنگە ف عشوه و ناز.

**نازونیاز:** نازکردن‌و دڵدانەوە ف نازکردن و دلداری دادن.

**نازونیمناز:** نازونوز ف نازونیمناز.

**نازونیوناز:** نازونوز ف نازونیمناز.

**نازە:** گۆشتی بن ناخون ف گوشت زیر ناخن.

**نازەریف:** ۱) ناپەسند؛ ۲) ناحەز ف ۱) ناپسند؛ ۲) بدگل.

**نازەنـاخوُن:** نازەی ناخوُن، بن نینوك ف بخشی از ناخن که زیر پوست قرار دارد.

**نازەنگوشت:** قوُچەکە ف انگشتانه.

**نازەنین:** ۱) بەنـاز، نازدار؛ ۲) ناوی ژنـانە؛ ۳) گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد ف ۱) نازنین؛ ۲) نام زنـانـه؛ ۳) از روستـاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**نازەی‌ناخوُن:** بن نینوك ف بخشی از ناخن که زیر پوست قرار دارد.

**نازێ:** ۱) نازەنین؛ ۲) لە منـداڵ‌بوُن بێ‌بەشـە؛ ۳) ناوی‌ژنـانـە ف ۱) نازنین؛ ۲) نمی‌زاید؛ ۳) نام زنانه.

**نازیەك:** نازرینگ ف کودن.

**نازین:** ۱) شانـازی‌کردن؛ ۲) پاڕێزگار شك‌بردن ف ۱) فخر و مباهات کردن؛ ۲) دلگرم بودن و محافظ گمان بردن.

**ناژ:** داری سنوَبەر، ناژ ف درخت صنوبر.

**ناژو:** ناژ ف درخت صنوبر.

**ناژین:** ۱) ناژ؛ ۲) ئێمـە ئەمـرین؛ ۳) ئەمرن ف ۱) درخت صنوبر؛ ۲) می‌میریم؛ ۳) می‌میرند.

**ناس:** ۱) ئاشنـا، پێچـەوانـەی بیانی؛ ۲) جۆرێ توتن‌و قسڵ‌و زەڕنیخە دەیمژن؛ ۳) پاشگری بەمانا ئاگادار لە کەسێ یا شتێ ف ۱) شناس؛ ۲) نوعی توتون مکیدنی مخلوط با آهك و دیگر مواد، ناس؛ ۳) پسوند به معنی شناس.

**ناساخ:** ۱) لەش‌بەبار، بێمار؛ ۲) عەیب‌دار ف ۱) بیمار؛ ۲) معیوب.

**ناساخی:** لەش‌بەباری ف بیماری.

**ناساز:** ۱) لەش‌بەبار؛ ۲) کەم‌دەست، ناتەواو ف ۱) بیمار؛ ۲) کم‌درآمد.

**ناسازگار:** لە لەش ناخۆش ف ناسازگار.

**ناساغ:** ناساخ ف نگا: ناساخ.

**ناساغی:** ناساخی ف بیماری.

**ناساق:** ناساخ ف نگا: ناساخ.

**ناساقی:** ناساخی ف بیماری.

**ناسان:** لێ‌شارەزابوُن، بەحاڵ‌وباڵ‌زانین ف شناخت.

**ناساندن:** پێ‌ناسین، کردنەشناس ف مُعرفی کردن.

**ناسر:** گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**ناسران:** شناس‌بوُن ف شناخته‌شدن.

**ناسراو:** ۱) ناس، ئاشنا؛ ۲) خەڵك زانیویە چیە یان کێ‌یە؛ ۳) برێتی لە خاوەن دەنگ‌و ناو ف ۱) آشنا؛ ۲) شناخته‌شده؛ ۳) کنایه از مشهور.

**ناسرکـوژراو:** لەو گونـدانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**ناسـرە:** گونـدێکـە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**ناسزا:** پێچەوانەی شیاو، نالایق ف ناشایسته.

**ناسك:** نازك ف نگا: نازك.

**ناس کرن:** ۱) بە دیتن شارەزابوُن لە چلۆنەتی کەسێ یا شوێنێ، ناسین؛ ۲) ناسینەوە ف ۱) شناختن؛ ۲) بازشناختن.

**ناسـك‌نارنجی:** بە کەسێ دەڵێن کە زۆر ناز دەکـاو خۆی لە خەڵك بە زیاتر دەزانێ ف نازنازیِ متکبّر.

**ناسکۆڵە:** ناسکی بچکۆڵە ف نازك کوچولو، نازك مامانی.

**ناسکـە:** ۱) باریکایەك لە شت؛ ۲) ناسك، نازك؛ ۳) ناوە بۆ ژنان؛ ۴) جۆرێ کولێرە: (کـولێرە ناسکە)؛ ۵) قروسکەی تاژی ف ۱) نوار باریك از چیزی؛ ۲) نگـا: نازك؛ ۳) نام زنانه؛ ۴) نوعی گردهٔ نان با شیر و روغن؛ ۵) نالهٔ سگ شکاری.

**ناسکەرمێ:** جۆرێ هەرمێ ف نوعی گلابی.

**ناسکەناسك:** ناڵەو قروسکەی تاژی ف ناله و صدای آهستهٔ سگ شکاری.

**ناسکەنام:** لەش‌ناسك ف نازك اندام.

**ناسکەنان:** کولێرەناسکە ف گرده نان با شیر و روغن.

**ناسکەهەرمێ:** ناسکەرمێ ف نوعی گلابی.

**ناسنامە:** پێناس ف شناسنامه.

**ناسوّر:** ۱) برینی تەشەناکردو؛ ۲) دومەڵی قونێر ف ۱) زخم دیر التیام؛ ۲) دُمَل.

**ناسـویر:** گونـدێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**ناسیار:** ئاشنا، شناس، ناس ف آشنا.

**ناسیاری:** ئاشنایی ف آشنایی.

**ناسیاگ:** ناسراو ف شناخته‌شده.

**ناسیاو:** ناسیار ف آشنا.

**ناسین:** ناس کرن ف شناختن.

**ناسینەوە:** دوای دوُری ناس کرن ف بازشناختن.

**ناشاد:** غەمگین ف اندوه گین، غمگین.

**ناشارەزا:** نابەلەد ف ناوارد.

**ناشایس:** ناسزا ف ناشایسته.

**ناشایست:** ناشایس ف ناشایسته.

**ناشایسته:** ناشایس ف ناشایسته.

**ناشت:** بەرەو ئەیره، بەملایەوە، بوئێره ف به این طرف.

**ناشتا:** ۱) خورێن؛ ۲) بەرچایی، تاشت ف ۱) ناشتا؛ ۲) صبحانه، چاشت.

**ناشتاکردن:** تاشت‌خارن، بەرچایی کردن ف صبحانه‌خوردن.

**ناشتایاشتا:** ئێرەوئەوێ ف اینجا و آنجا.

**ناشتداشت:** ئێرەوئەوێ ف اینجا و آنجا.

**ناشتداشتا:** ئێرەوئەوێ ف اینجا و آنجا.

**ناشتن:** ۱) چەقاندنی ڕیشەی دار؛ ۲) مردو تەمراندن ف ۱) کاشتن نهال؛ ۲) مرده دفن کردن.

**ناشتو:** نێژراو، بن گڵ خراو ف دفن شده.

**ناشتوناشت:** لێر و لەوێ ف اینجا و آنجا.

**ناشتی:** ۱) ناشتو؛ ۲) نیای، ژێرخاکی کرد، کردیە ژێرخاکەو ف ۱) دفن شده؛ ۲) آن را دفن کرد.

**ناشرین:** ۱) ناحەز، بێ‌بەش لە جوانی؛ ۲) کارو قسەی خراپ ف ۱) بدگل؛ ۲) گفتار و رفتار زشت.

**ناشکور:** بێ‌نەمەگ، بێ‌نەزان، سپڵە ف ناسپاس.

**ناشکوری:** سپڵەیی، بێ‌نەزانی ف نمک‌نشناسی، ناسپاسی.

**ناشکیر:** ناشکور ف ناسپاس.

**ناشوٚ:** محاڵ، شتێ کە جێ‌بەجێ‌بوُنی فر یە دژوارە ف ناممکن.

**ناشوٚر:** بەرگ‌و کەل‌پەلێ کە بەخاوێنی ڕادەگیرێ بوٚ ڕوٚژی لازم ف لباس پاکیزه برای مواقع لزوم.

**ناشەر:** نارەوا ف ناروا.

**ناشی:** کەسێ کە لە کاردا ناشارەزایە ف ناشی، ناوارد.

**ناشێ:** نابێ، نارەوایە ف شایسته‌نیست، نمی‌شود.

**ناشیرن:** ناشرین ف نگا: ناشرین.

**ناشیرنی:** ناحەزی، بێ‌بەهرەیی لە جوانی ف نازیبایی.

**ناشیرین:** ناشرین ف نگا: ناشرین.

**ناشیرینیەتی:** ناحەزی ف نازیبایی.

**ناشیزه:** ناچیزه ف زن نافرمان شوهر.

**ناعار:** بێ‌عار، لاسار ف حرف نشنو، لجباز.

**ناعال:** بنیادەمی بێکارەو بێ‌قەدر ف آدم بی ارزش.

**ناعس:** ۱) تەمەڵ؛ ۲) بێ‌کارەو بێ‌کەڵك ف ۱) تنبل؛ ۲) بیکاره.

**ناعف:** قازانج، نەحف، بەهره، فێده ف سود.

**ناعفەت:** قازانج ف سود.

**ناعلەت:** نەحلەت ف لعنت.

**ناعلەتی:** نەحلەتی، شتی زوٚر خراپ‌و بەلا ف لعنتی.

**ناعنـــە:** گیایەکی گەڵاوردی تام‌تیژی بوٚن‌خوٚشـــە ئیشـــك دەکرێ‌و دەچێشتی دەکەن ف مَرزه.

**ناعوایش:** میاومیاوکردن کتْك ف صدای گربه.

**ناعوُر:** چەرخێ کە دەناو بیرداو بە حەیوان ئاوی پێ دەخەنەدەر ف چرخ آبکشی از چاه که به وسیلهٔ حیوان کار می کند.

**ناعوُره:** ناعوُر ف نگا: ناعوُر.

**ناعەز:** ناحەز ف نازیبا، زشت.

**ناعەسڵ:** ناحەسڵ، نارەسەن، ناجسن ف بداصل.

**ناعیلاج:** ناچار، مەجبوُر ف ناچار.

**ناغار:** تیغی دەبانی زوٚر چاك، ناخار ف تیغ بسیار خوب.

**نافام:** تێ‌نەگەیشتو، گێلوٚکە ف نفهم، نادان.

**نافامی:** دەبەنگی، ساویلکەیی ف نادانی، ساده‌لوحی.

**نافك:** ۱) قوُڵاییەکی بچوُکی لێوارزەقە لە ناوەڕاستی زگ‌دا، ناوك، نێوك؛ ۲) کاکڵ ف ۱) ناف؛ ۲) مغز بادام و گردو و...

**نافەرمان:** سەرشەق، سەربزێو ف نافرمان.

**نافەرمانی:** سەربزێوی ف سرکشی.

**نافەك:** ۱) پارچەی سێ‌سوُچی ناوەڕاستی دەرپێ؛ ۲) پزوی دەرپێ ف ۱) خشتك شلوار؛ ۲) نیفه، جای بند تنبان.

**ناڤ:** ۱) وشـەی پێ‌ناسین بوٚ هەر شتێ؛ ۲) دور، دەرونی هەر شتێ؛ ۳) نافکی زگ ف ۱) نام؛ ۲) وسط؛ ۳) ناف.

**ناڤ‌ئانین:** درکاندنی ناوی شتێ ف نام بر زبان آوردن.

**ناڤاندن:** ناولێ‌نان ف نام بر چیزی یا کسی گذاشتن.

**ناڤ‌ئێش:** زگ‌ئیشه ف شکم درد.

**ناڤبار:** ۱) قەرتاڵەی میوه، تریان؛ ۲) سەربار ف ۱) سبد میوه؛ ۲) اضافه‌بار.

**ناڤبارك:** ۱) ناقباری پچوُك، قەرتاڵوٚکە؛ ۲) سەربار ف ۱) سبد کوچك؛ ۲) اضافه‌بار.

**ناڤبڕ:** ۱) تیغه، لەمپەر؛ ۲) نزیکترین‌ڕێ بوٚ گەیشتن ف ۱) تیغه؛ ۲) راه میانبر.

**ناڤبڕك:** بەرزەك، بەرزایی نێوان دوشْت ف میانه.

**ناڤ‌برن:** باس کردن ف نام بردن.

**ناڤبروٚ:** ۱) ناوچاوان، توێڵ؛ ۲) بەین دوُبروٚ، دوڕ هەردو بروٚ ف ۱) پیشانی؛ ۲) میان دو ابرو.

**ناڤبری:** ناڤ گوتراو، باسکراو ف نامبرده.

**ناڤبریك:** چیل، پەرژین ف پرچین.

**ناڤبژی:** کـەوتنەبەینی دو دژەوە بـوٚئاشت‌کردنەوەو پێك‌هێنـان ف میانجیگری.

**ناڤبژی کەر:** کەسێ کە ناڤبژی دەکا ف میانجی.

**ناڤبەر:** ۱) نێوان، مابەین؛ ۲) سەرپشك ف ۱) میانه، فاصله، مابین؛ ۲) صاحب امتیاز.

**ناڤبەند:** ناوەڕاست، ناوەند ف وسط.

**ناڤبێژ:** ۱) پارێزەر لە دادگا، وەکیل؛ ۲) تکاکار؛ ۳) دەلاڵی شت‌فروٚش ف

١) وكيل مُدافع؛ ٢) شفيع؛ ٣) سمسار.

**ناڤبەین:** مابەین [ف] میانه، مابین.

**ناڤتەنگ:** تەنگە، کەمەربەندی زین و کورتان [ف] تنگ ستور.

**ناڤ تێ دان:** دنەدان [ف] تحریك کردن، تشجیع کردن.

**ناڤ جەژنان:** مانگی نێوان شەشەکان و قوربان [ف] ماه ذی القعده.

**ناڤچاڤ:** ناوچاوان، توێڵ، ئەنی [ف] پیشانی.

**ناڤچاڤ ترش:** ڕۆکرژ، مڕومۆچ [ف] اخمو.

**ناڤچال:** دیوی ئاوەژوی قوقز [ف] مُقعّر.

**ناڤچوون:** ڕەوان بوون، بەلەفیرەدار [ف] اسهال بودن.

**ناڤچە:** مەڵبەند، محال، ناوچە [ف] ناحیه، منطقه.

**ناڤچەق:** ١) ناوەڕاست، دوڕ، ناوەند؛ ٢) ناوگەڵ [ف] ١) نقطهٔ وسط؛ ٢) بین دو ران.

**ناڤچەنگ:** بن هەنگڵ، بنەنگڵ، کەوش [ف] زیر بغل.

**ناڤچی:** ناوجی کەر، ناوبژی [ف] میانجی.

**ناڤچیت:** ١) ناڤچی؛ ٢) دەلاڵی شت فرۆشتن [ف] ١) میانجی؛ ٢) سمسار.

**ناڤخۆ:** خۆیایەتی، بەرانبەر بە بێگانە [ف] خودی، مقابل بیگانه.

**ناڤدار:** ١) مەنشوور، بەدەنگ و ناو؛ ٢) پێچەوانەی بەتاڵ و پووچ [ف] ١) نامدار؛ ٢) پر، مقابل تهی.

**ناڤدارا:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد [ف] روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**ناڤدان:** ناڤ تێ دان [ف] تشجیع.

**ناڤ دانین:** ناڤ بۆ کەسێ یان شتێ دیتنەوە و پەسند کردن [ف] نام نهادن.

**ناڤدایەك:** ١) بینەکێش، چوونە ژێر ئاو؛ ٢) جوێن فرۆش [ف] ١) غوطه‌ورشدن؛ ٢) بددهن.

**ناڤدایی:** ناودێر، ناوراگەیەنراو [ف] کاندیدا.

**ناڤدۆ:** نادۆك، دارمەشکە [ف] نگا: نادوك.

**ناڤدەر:** بەردەرانە [ف] ضلع پایین چهارچوب در.

**ناڤدەرگ:** مۆغەرەی پشت، بڕبڕەی پشت [ف] ستون فقرات.

**ناڤدەست:** لەپ، بەری دەست [ف] کف دست.

**ناڤدەشت:** دەشتایی لەناو کێواندا [ف] دشت محصور به کوهستان.

**ناڤدەنگ:** ناوبانگ [ف] شُهرت.

**ناڤدێر:** ١) ناف بۆدانراو؛ ٢) خودان دەنگ و ناف؛ ٣) ناف گوتن بۆ سپاردنی کارێ [ف] ١) نام نهاده، موسوم؛ ٢) نامدار؛ ٣) نامزد، کاندیدا.

**ناڤڕان:** ناوگەڵ، دوڕ هەردو لینگان [ف] میان دوران.

**ناڤرۆ:** جزیرەی نێوان روبار [ف] جزیرهٔ واقع در رودخانه.

**ناڤرۆجە:** نیوەڕۆ [ف] نیمروز.

**ناڤرۆنك:** ناڤرۆ [ف] جزیرهٔ واقع در رودخانه.

**ناڤرە:** جزیره، ئاد، دورگە [ف] جزیره.

**ناڤزك:** ١) هەناو؛ ٢) سی و جەرگ و دڵ [ف] ١) احشاء؛ ٢) دل و جگر و ریه.

**ناڤسال:** تازەپیر، نێوان سال [ف] میانسال.

**ناڤسەر:** ترۆپك، دوند [ف] بلندترین نقطه در کوه یا درخت.

**ناڤسەرك:** ١) کڵاوزێڕ؛ ٢) تانج [ف] ١) زرّین کُلاه؛ ٢) تاج.

**ناڤشان:** قەلاندۆش، ناوملان، ناف قۆڵنج [ف] دوش، شانه.

**ناڤشكی:** گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد [ف] از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**ناڤ قۆڵنج:** ناڤشان [ف] شانه، دوش.

**ناڤقەد:** ١) مەیانی بەژنی مرۆ؛ ٢) قەدی چیاو دار [ف] ١) کمر آدمی؛ ٢) کمر کوه و درخت.

**ناڤك:** ١) نافکی زگ؛ ٢) کاکڵ [ف] ١) ناف؛ ٢) مغز بادام و گردو و...

**ناڤ کرن:** مەنشوور بوون [ف] نامدارشدن، مشهورشدن.

**ناڤکەل:** دوڕ هەردوڕان، گەڵ [ف] میان رانها.

**ناڤکەندالا:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد [ف] روستایی درکردسان که بعثیان آن را ویران کردند.

**ناڤگە:** ڕەزاو، ڕێژاو، شوێنێ کە دوچەم دەگەنەوە یەك [ف] محل بهم پیوستن دو رودخانه.

**ناڤگین:** نێونجی، بەین [ف] وسط.

**ناڤ لخۆدان:** خۆهەڵکێشان [ف] لاف زدن.

**ناڤ لێ کرن:** ناڤ دانین [ف] نام نهادن.

**ناڤمال:** کەل‌پەلی ماڵ، مردەماڵ [ف] اثاثیه.

**ناڤمالی:** کارەکەر، کڵفەت، جێری، خدامە، قەرەواش [ف] کُلفت، خدمتکار زن.

**ناڤنج:** مام ناونجی، دەستە [ف] میانه، متوسّط.

**ناڤنۆ:** ١) خزمی دوور؛ ٢) بەدرۆ خۆ بە هەژارو نەدار شاندان؛ ٣) ناوزڕاو، بەدناو [ف] ١) فامیل دور؛ ٢) خود را به فقیری زدن؛ ٣) بدنام.

**ناڤنۆبوون:** بەدناوی، ناوزڕان [ف] بدنامی.

**ناڤنۆکرن:** بەدناو کرن [ف] بدنام کردن.

**ناڤنەتەوەیی:** تێکەڵاوی گەلانی دنیا، نافنەژادی [ف] بین المللی.

**ناڤنەژادی:** ناڤنەتەوەیی [ف] بین المللی.

**ناڤەر:** ١) دالان؛ ٢) ئێرە [ف] ١) راهرو؛ ٢) اینجا.

**ناڤەرۆك:** ناوئاخنی پەراوەو نوسراو [ف] محتوای مطلب.

**ناڤەند:** ناوەڕاست، دوڕ [ف] وسط.

**ناڤودەنگ:** دەنگ و ناف [ف] شهرت.

**ناڤی:** دوڕ، مەیان [ف] وسط، میان.

**ناڤین:** ناڤنج، مام ناونجی، دەستە [ف] میانه، میانگین.

**ناق:** گەرو، قورگ [ف] گلو.

**ناقابیل:** ١) کارلەدەست نەهاتو، بنیادەمی بێ قیمەت؛ ٢) شتی کەم قەدر: (دیاریەکی ناقابیلە) [ف] ١) آدم بیکاره؛ ٢) بی ارزش.

**ناقایل:** نارازی [ف] ناخشنود.

**ناقر:** ١) گەردن، دەرەوەی گەرو ٢) کاری نیوەچڵ [ف] ١) گردن؛ ٢) کارناتمام.

**ناقز:** ناتەواو [ف] ناقص.

**ناقۆ:** نەقە، باقۆ، جۆرێ ماسیە [ف] نوعی ماهی است.

**ناقورچ:** سیخورمه ف سقلمبه.
**ناقوڵا:** ۱) نارێك، خوارو خێچو چەفتو لار؛ ۲) قسەزان و قسەخۆش ف ۱) ناهموار، ناهنجار؛ ۲) سخندان و شیرین سخن.
**ناقولچ:** ناقورچ ف سقلمبه.
**ناقیز:** بە کەموکوڕی، ناتەواو، ناقز ف ناقص.
**ناقیس:** ناقیز، ناقز ف ناقص.
**ناك:** ۱) پاشگری بەمانا خاوەن: (نەمناك، سامناك)؛ ۲) فەقیر، بێچارە؛ ۳) ناوك، نێوك ف ۱) پسوند دارا بودن؛ ۲) بینوا؛ ۳) ناف.
**ناکا:** ۱) تۆ بێژی، تۆبڵێی؟: (ناکا خوا بارانێك ببارێنێ)؛ ۲) لەوانەیە، بەمنزیکانە: (تۆ بڕۆ **ناکا** منیش هاتم)؛ ۳) بەجێ ناهێنێ: (چەندی دەڵێم وابکە **ناکا**)؛ ۴) نوکە، هەنوکە ف ۱) توقّع دارم، آیا می‌شود؟؛ ۲) بەزودی؛ ۳) نمی کند؛ ۴) همین الآن.
**ناکام:** بێ‌مراد ف ناکام.
**ناکاو:** کتوپڕ ف ناگهان، یکهو.
**ناکشت:** ئەملایە ف این طرف.
**ناکڵۆك:** دانەوێڵەیێ کە لە کوڵیندا چیڕە ف دیرپز.
**ناکڵۆکار:** ناقوڵا ف ناهنجار.
**ناکۆ:** نەگەرنە، دەنا ف وگرنه.
**ناکۆك:** بێ کەیف، ناساز ف پریشان‌حال.
**ناکۆکی:** ۱) بێ کەیفی؛ ۲) مابەین ناخۆشی ف ۱) بدحالی؛ ۲) میانه خوب نبودن، کدورت.
**ناکوڵۆکار:** زبرو خوارو خنج ف ناهموار، ناهنجار.
**ناکەت:** ناکا، خۆ تێ ناگەیەنێ ف نمی کند.
**ناکەتن:** ناکەت ف نمی کند.
**ناکەس:** ناجسن، خوێڕی ف ناکس.
**ناکەسی:** ناپیاوی ف نامردی.
**ناگا:** ۱) کتوپڕ، ناکاو؛ ۲) لە بڵندیو درێژیدا بەرانبەر نایەت؛ ۳) لەدەستی نایە، رانـاگا؛ ۴) وازو دەمی خواردنی نایە؛ ۵) لە گەیشتن بەجێ‌دەمێنێ: (بە دوسەحات لەوێوە **ناگا**) ف ۱) ناگاه؛ ۲) نمی‌رسد، کوتاه است؛ ۳) از دستش برنمی‌آید؛ ۴) میوه نمی‌رسد؛ ۵) سر وقت نمی‌رسد.
**ناگوزوری:** دەس‌تەنگی، فەقیری ف بینوایی، تنگدستی.
**ناگوناح:** بێ‌تاوان، بێ‌سوچ ف بی گناه.
**ناگەوار:** ناخۆش، بۆ خەبەری ناخۆش دەڵێن: (خەبەرێکی **ناگەوارو** دڵ‌تەزێنە) ف ناخوشایند.
**ناگەهان:** کتوپڕ، گزوگومەت، لەپڕ ف ناگاه، ناگهان.
**نال:** ۱) پێڵاوی یەکسم لە ئاسن؛ ۲) پرزەی باریکی دوو قەڵەمی قامیش ف ۱) نعل ستور؛ ۲) رشتهٔ نازك قلم نی.
**ناڵ:** ۱) پێڵاوی یەکسم؛ ۲) پارچەئاسنی ژێر پاژنەکەوش ف ۱) نعل ستور؛ ۲) نعل کفش.
**ناڵان:** کەسێ کە لەتاوی خەمو دەرد دەکرۆزێتەوە ف نالان.
**ناڵاندن:** کرۆزانەوە لە دەردو داخ ف نالیدن.
**ناڵانن:** ناڵاندن ف نالیدن.
**ناڵای:** ناڵاندن ف نالیدن.
**نالایش:** ناڵین ف نالیدن.
**نالایەنە:** ناڵاندن، ناڵین ف نالیدن.
**ناڵبەکی:** ژێرئیستیکان، ژێرپیاڵە ف نعلبکی.
**ناڵبەن:** کەسێ کە ناڵ بۆ یەکسم دەکا ف نعلبند.
**ناڵبەند:** ۱) ناڵبەن؛ ۲) نازناوی شاعیرێکی کوردی هاوچەرخە ف ۱) نعلبند؛ ۲) تخلّص شاعری معاصر کردزبان.
**نالبەنیش:** ۱) لەسەرلا خەفتگ؛ ۲) نەخش‌کردن لە قوماش ف ۱) بر پهلو خوابیده؛ ۲) نقش درآوردن روی پارچه.
**نالبیر:** دارهەنار ف درخت انار، ناربن.
**ناڵپاریز:** گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.
**نالجاخ:** ۱) پێمەڕۆکە، بێڵچە؛ ۲) زەنگن، قوڵینگی زەوی کوڵین ف ۱) بیلچە؛ ۲) کُلنگ.
**نالجخ:** تەور، بیوڕ ف تبر.
**ناڵچە:** ناڵی کەوش ف نعلچهٔ کفش.
**ناڵدار:** یەکسمی سواری: (**ناڵدار** هاتوە ناڵی پەڕاندوە باڵدار هاتوە باڵی وەراندوە) «مەسەل» ف مال‌سواری.
**ناڵك:** ۱) قاپقاپ، سوڵ؛ ۲) کەوشی سوکو بێ‌پاژنە ف ۱) دمپایی؛ ۲) نعلین.
**ناڵ کردن:** ۱) ناڵ بۆ یەکسم کردن؛ ۲) ناڵ لەکەوش‌دان؛ ۳) تاشینی لایەکی دار بۆ جوت‌بون؛ ۴) برێتی لە فریودان و دەس‌بڕین ف ۱) نعل به پای ستورزدن؛ ۲) نعلچه به‌کفش زدن؛ ۳) تراشیدن چوب برای جفت شدن با چوب دیگر؛ ۴) کنایه از فریب و کلاهبرداری.
**نالمکی:** سینی پچوك، قاوەسینی ف سینی کوچك.
**نالن:** برێتی لە فریودان ف کنایه از فریب‌دادن.
**نالنی:** ناڵاندن ف نالیدن.
**ناله:** ۱) سوکەناوی نادر، ناوە بۆ پیاوان؛ ۲) ناڵ ف ۱) مخفف نادر، نام مردانه؛ ۲) نعل.
**ناڵە:** کرۆزانەوە لە دەردو خەم ف ناله.
**نالەبار:** ۱) نارێك؛ ۲) ناباب ف ۱) ناهموار؛ ۲) ناباب.
**نالەت:** لەعنەت ف لعنت.
**ناڵەشکێنە:** ناوی دوکێوە لە کوردستان ف نام دو کوه در کردستان.
**ناڵەکردن:** ناڵاندن ف نالیدن.
**ناڵەکی:** پاژنەی ژێر کەوش ف پاشنهٔ زیرین کفش.
**ناڵەناڵ:** ناڵەی زۆر ف نالهٔ بسیار.
**نالەنە:** ناڵاندن ف نالیدن.
**نالی:** ۱) دۆشەك؛ ۲) نازناوی شاعیری بەناوبانگی کورد. *بەمانا زراو لەگوێن پرزەی ناو قەڵەمی قامیش* ف ۱) تشك؛ ۲) تخلّص یکی از شعرای مشهور کرد.
**ناڵێ:** ۱) نابێژێ، قسیە ناکا؛ ۲) تەنیا ئێك‌ناڵ ف ۱) نمی گوید؛ ۲)

تك نعل.

**ناڵیچە:** دۆشەکۆڵە [ف] تشکچە.

**ناڵیقـە:** گوندێکـە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد [ف] از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**ناڵیك:** دۆشەکی لەسەرخەوتن، رایەخی ناوتێخراو [ف] تُشك.

**نالین:** ناڵەکردن، ناڵاندن [ف] نالیدن.

**نالێن:** ۱) نابێژن؛ ۲) سۆلی لەتەختە، قاپقاپ [ف] ۱) نمی‌گویند؛ ۲) نعلین.

**ناڵین:** ناڵاندن [ف] نالیدن.

**ناڵێن:** قسەناکەن، ناخێون [ف] نمی‌گویند.

**نام:** ۱) ناف، وشـەی درۆشمی ناسین؛ ۲) یان، نا: (**نام** تۆ بچو **نام** من دەچم)؛ ۳) دام‌نا، خستمەبان: (بەردەکەت لەسەر دانا؟ بەڵێ **نام**) [ف] ۱) نام؛ ۲) یا؛ ۳) نهادم.

**ناما:** ۱) دەغیلە؛ ۲) دەی [ف] ۱) زینهار؛ ۲) حرف تشجیع.

**نامارك:** پێچەوانەی ممبارەك، شوم، نەحس [ف] نامیمون.

**نامارەك:** نامارك [ف] نامیمون.

**ناماقوڵ:** ۱) قسەی بێ‌تام؛ ۲) بنیادەمی بێ‌قەدر [ف] ۱) سخن ناپسند؛ ۲) آدم بی‌ارج.

**نامان:** خستمانەسەر [ف] نهادیم.

**نامانگوری:** ناگوزوری، فەقیری [ف] نداری، تنگدستی.

**نامانگی:** ۱) ماندوو نەبی؛ ۲) ماندوو نیت؟ [ف] ۱) خستەنباشی؛ ۲) خستەنیستی؟.

**نامدار:** بەدەنگ‌و ناو، مەنشوور [ف] مشهور.

**نامراد:** ناکام [ف] ناکام.

**نامرادی:** ناکامی [ف] ناکامی.

**نامروڤ:** ناپیاو، کەسێ کە لە مەردایەتی دوورە [ف] نامرد.

**نامزات:** ناڤدێر، ناڤدایی [ف] کاندیدا.

**نامزەد:** نامزات [ف] کاندیدا.

**نام‌ڤەت:** بەدناو، ناوزریاگ [ف] بدنام، رسوا.

**نامل:** ناوشان، کۆڵ، نێوان‌هەردوبیل [ف] شانە، کول.

**نامۆ:** بیانی، بێگانە، غەریبە، غەوارە [ف] بیگانە.

**ناموارەك:** نامارەك، شوم [ف] نامیمون.

**نامووس:** شەرەف، ئابڕو [ف] ناموس.

**نامۆیی:** بێگانەیی [ف] بیگانگی.

**نامە:** ۱) ناما، دەغیلە؛ ۲) دەی، وشەی دنەدان: (**نامە**ڕاکەن بگەنێ)؛ ۳) قاقـەزی نوسراو بۆ بەڕێکردن؛ ۴) دەنگ‌و باسی نوسراو لەکتێبدا: (رۆستەم**نامـە**)، ۵) نیمـە دامـان‌نا: (سـەرنـامەیی نامە **نامە** ئەڵلا) «خانی»؛ ۶) ناو، نام [ف] ۱) زنهار؛ ۲) کلمهٔ تشجیع؛ ۳) نامە؛ ۴) اخبار حوادث گرداوری شده در کتاب؛ ۵) قرارداد کردیم؛ ۶) نام، اسم.

**نامەبەر:** پۆستەچی [ف] نامەرسان.

**نامەت:** نەگبەت [ف] نکبت.

نامەتش: ۱) لوولدان، پێچان؛ ۲) هوێنانەوە [ف] ۱) پیچاندن؛ ۲) تاب دادن.

**نامەحرەم:** پێچەوانەی مەحرەم [ف] نامحرم.

**نامەخانە:** کتێبخانە [ف] کتابخانە.

**نامـەخـوا:** ۱) وشـەی سەیرمـان: (**نـامەخوا** سەیرە)؛ ۲) وشەیەکە بۆ خۆشـەویستی دەڵێن کە لەچـاو نەچێ: (**نـامەخوا** گەورەبوە) [ف] ۱) کلمهٔ تعجّب؛ ۲) کلمەای برای محفوظ ماندن از بلا، ماشاءالله.

**نامەد:** بەدبەختی، خراپ‌بۆهاتن [ف] بدبیاری.

**نامەدار:** نامدار، بەناوبانگ [ف] نامدار.

**نامەڕبوت:** قسەی قوڕو لابەلا [ف] سخن نامربوط.

**نامەرد:** ناپیاو، نامروڤ [ف] نامرد.

**نامەردی:** ناپیاوی، نائینسانەتی [ف] نامردی.

**نامەرەم:** نامەحرەم [ف] نامحرم.

**نامی:** ۱) بەدەنگ‌و ناو، مەنشوور؛ ۲) نازناوی شاعیرێکی هاوچەرخە؛ ۳) چۆڵەچرا [ف] ۱) نامور، نامی؛ ۲) تخلّص شاعری معاصر؛ ۳) نیمسوز.

**نامیلکە:** سیپارە، کتێبۆکە [ف] رسالە.

**نامیە:** ۱) ئـەو منی خستە دوور؛ ۲) من تۆم خستە دوور: (لەبیرتە **نامیە** ناو سندووقەوە) [ف] ۱) او مرا بە میان برد؛ ۲) من ترا بە اندرون بردم.

**نامی‌یە:** ناڤدار [ف] نامدار.

**نان:** ۱) ئاردی بەئاوشێلدراوی پانەوەکراوی بەئاگر برژاو؛ ۲) چەقاندن: (بـاغم **ناوە**)؛ ۳) دانان، شتێ خستنەسەر شتێ؛ ۴) تێ‌ڕۆکردن: (نان دەتەبەك**نان** چیە؟)؛ ۵) جارێك بە دار لەتۆپ‌دان لە تۆپەڕاکردندا [ف] ۱) نان؛ ۲) غرس کردن؛ ۳) برنهادن؛ ۴) تونهادن؛ ۵) توپ را با چوب زدن در نوعی توپ‌بازی.

**نانا:** ۱) پیادە؛ ۲) پیادەڕێ [ف] ۱) پیادە؛ ۲) راه پیادەرو.

**نانتیرە:** نانی‌تیری، نانی تەنك کە بەتیروك گەراوە [ف] نان لواش.

**نانائەیقەك:** نان‌و خوانی زەماوەند [ف] غذای جشن عروسی.

**ناناقەیقی:** ناناقەیقەك [ف] غذای عروسی.

**ناناقەیەك:** ناناقەیقی [ف] غذای عروسی.

**ناناقێك:** ناناقەیەك [ف] غذای عروسی.

**نان‌بدە:** دەهندە، بەخشندە [ف] سخی، بخشندە.

**نان‌بدەیی:** سەغاوەت، بەخشندەیی، دلاوایی [ف] بخشندگی.

**نان‌براژتن:** ئەنگوتك بەتەنوورەوەدان‌و برژاندنی [ف] نان پختن.

**نان‌برێژ:** کەسێ کە ئەنگوتك بەتەنوورەوە ئەدا [ف] نانوا.

**نان‌برێشـك:** داروکـەیەکی لە تیروك باریك‌تر کە نانی سەرسـاجی پێ ئەودیوئەم‌دیو دەکەن [ف] چوبکی کە نان بدان روی ساج برگردانند.

**نان‌برین:** برێتی لە بێ‌بەش‌کردن لە بژیو [ف] کنایە از باعث قطع درآمدشان.

**نان‌بژێر:** ۱) نان‌برێژ؛ ۲) برێتی لە پیاوی ڕەزیلی ئەنگـوتـك‌بژێر [ف] ۱) نانوا، شاطر؛ ۲) کنایە از خسیس در منزل.

**نان‌بەیات:** نانی کۆن کە شەوی بەسەردا هاتبێتەوە [ف] نان بیات.

**نان‌پات:** نان‌برێژ [ف] نانوا، نان‌پز.

**نان‌پاتن:** نان‌براژتن ف نان پختن.

**نان‌پرسه:** چێشت‌و نانێ که له‌سه‌ره‌خۆشی‌دا ده‌درێ به خه‌ڵك ف غذایی که در مجلس عزا توزیع می‌شود.

**نان‌پیزه:** کرێکاری بێ کرێ‌و هه‌ر به‌خواردن، نانه‌زگ ف کارگری که فقط غذایش بدهند.

**نان‌پێژ:** نان‌برێژ ف نان‌پز، نانوا.

**نان‌پێژان:** نان‌براژتن، نان‌پاتن ف نان پختن.

**نان‌پێوه‌دان:** ئه‌نگوتك به‌ته‌نوره‌وه لکاندن ف نان بر تنور چسباندن.

**نان‌پێوه‌ده‌ر:** که‌سێ که ئه‌نگوتك به‌ته‌نوره‌وه ئه‌لکێنێ ف نان به تنور چسبان.

**نان‌تاڵ:** بریه‌تی له پیاوی چروك‌و ڕژد ف کنایه از خسیس.

**نان‌تیری:** نانی ته‌نك که به تیرۆك پان‌ده‌کرێته‌وه ف نان لواش.

**نان‌جه‌ژن:** چێشتێ که له‌جه‌ژن‌دا لێ‌ده‌نرێ ف غذای عید.

**نان‌چایی:** جۆرێ نانی شیرین بۆ به‌یانان ف نان شیرینی صبحانه.

**نان‌چله:** خۆراکێ که له‌بیره‌وه‌ری چل‌ڕۆژه‌ی مردودا ده‌درێ ف طعـام چهلم متوفّی.

**نان‌حه‌فتـه:** خۆراك‌و مه‌یمـانی‌دان پاش گوازتنه‌وه‌ی بوك به‌حه‌وڕۆژ ف سور هفتهٔ بعد از عروسی.

**نان‌خاڵی:** نان به‌بێ پێ‌خۆر ف نان بدون خورش.

**نان‌خۆر:** بریتی له خێزان‌و منداڵ: (**نانخۆرمان زۆرن**) ف کنایه از فرزندان و افراد خانواده.

**نان‌خۆرشت:** پێخۆر ف نانخورش.

**نان‌خه‌ته‌نه:** خه‌ته‌نه‌سوران ف ختنه‌سوران.

**نان‌دان:** ۱) خۆراك به‌فـه‌قیران‌به‌خشین؛ ۲) ته‌بـه‌کی‌نان ف ۱) طعـام بخشیدن؛ ۲) ظرف نان.

**نانـدرو:** دروێنه‌وان، دره‌وکه‌ری ده‌خڵ ف دروگر.

**نانـدۆز:** ماندو بۆ نان‌په‌یداکردن ف زحمتکش.

**نان‌ده:** نان‌بده ف سخاوتمند.

**نان‌ده‌ر:** نان بده ف بخشنده.

**نانـدێن:** ته‌به‌کی نان ف ظرف نان.

**نان‌ساجی:** نانێ که له‌سه‌ر سێڵ ده‌برژێ ف نان ساجی.

**نان‌سه‌نگه‌ك:** نانێ که له‌سه‌ر چه‌وی سوره‌وه‌بوگ ده‌برژێ ف نان سنگك.

**نان‌سێر:** ۱) نان‌ساجی؛ ۲) مه‌نجه‌ڵی سه‌رقه‌پاخدار ف ۱) نان ساجی؛ ۲) دیگ سرپوشدار.

**نانك:** ۱) پلوره‌هه‌نگ، شڵخه‌مێش؛ ۲) که‌لانه ف ۱) نسل نوین زنبور عسل؛ ۲) نگا: که‌لانه.

**نانکا:** ئیسه، نهۆ، نوکه، ئه‌لحان ف الآن، هم‌اکنون.

**نان کردن:** نان‌پێژان ف نان پختن.

**نانکۆر:** کوێرنان، ڕژد ف خسیس.

**نانکوێر:** کوێرنان ف خسیس.

**نانکه‌ر:** نان‌پێژ ف نان‌پز.

**نانکـه‌ره‌وه:** که‌سێ که ئه‌نگـوتك به‌تیرۆك پان‌ده‌کاته‌وه ف کسی که با چوب چونه را پهن می‌کند.

**نانکێ‌چوچکا:** تۆڵه‌که، نانه‌حاجیله ف پنیرك.

**نانکێ‌چویکا:** نانکێ‌چوچکا ف پنیرك.

**نانکێ‌مه‌ویژا:** کولیره‌یێ کشمیشی تێ‌کرابێ ف گرده‌نانی که آگنه‌اش کشمش باشد.

**نانکێ‌هه‌ژیرا:** نانه‌هه‌نجیر ف لواشك انجیر.

**نانگر:** زه‌وی به‌ڕێژه‌و ف زمین پرحاصل.

**نان گه‌نمی:** کولێره‌چه‌وره ف نان روغنی.

**نانگیر:** نانگر ف زمین حاصلخیز.

**نانگێن:** نانـدێن ف ظرف نان.

**نان‌ماڵ:** بریتی له مرۆیه‌ك که ئاتاجی که‌س نیه ف کنایه از آدم خودکفا.

**نان‌مکی:** نالمکی، سینی پچوك ف سینی کوچك.

**نانۆ:** نانخۆری بێکاره ف نان‌خور بیکاره.

**نانوئاو:** بریتی له بژیو، مایه‌ی ژیان ف کنایه از مایهٔ زندگی.

**نانۆباتیره:** نانی هه‌ڵنه‌هاتو ف نان فطیر.

**نانوچا:** بریتی له چاشت، خواردنی به‌یانی ف صبحانه.

**نانوحه‌لوا:** بریتی له کاری زۆر هاسان: (ئه‌م کاره بۆ من **نان‌وحه‌لوایه**) ف کنایه از کار بسیار آسان.

**نانوخ:** ناخو، ناخون ف ناخن.

**نانوزگ:** کرێکاری هه‌ربه‌خۆراك ف کارگر مزدور فقط با خوراك.

**نانوسۆل:** نان‌وخوێ، بریتی له بژیو ف کنایه از مایهٔ زندگی.

**نان‌وشکی:** نان‌خاڵی ف نان‌تهی.

**نان‌ونمه‌ك:** بریتی له چاکه‌پێ‌زانین ف کنایه از حق‌شناسی.

**نانووشك:** نان‌وشکی، نان‌خاڵی ف نان‌تُهی.

**نان‌وه‌وی:** چێشت‌و نانێ که سێ‌ڕۆژ له ماڵـه‌بابی بوکه‌وه بۆ ماڵ زاوای ده‌نێرن ف غذایی که سه‌روز از خانهٔ پدر عروس به خانهٔ داماد فرستند.

**نانه:** ۱) نان؛ ۲) تاقه‌نانێك ف ۱) نان؛ ۲) یك نان.

**نانه‌بان:** له‌سه‌ردانان ف برنهادن.

**نانه‌به‌ره:** ده‌فری نانی ڕێبوارو شوان‌و ده‌شته‌کی ف توشه‌دان مسافر و چوپان و...

**نانه‌پاڵ:** تۆمه‌ت‌پاڵدان ف متّهم کردن.

**نانـه‌جیب:** ۱) ناره‌سـه‌ن؛ ۲) ناکه‌س‌به‌چه، بێ‌ئاکار ف ۱) بدگهر؛ ۲) بداخلاق، بی‌تربیت.

**نانه‌حاجیله:** تۆڵه‌که، تۆره‌که ف گیاه پنیرك.

**نانه‌حاجی له‌گ له‌گ:** نانه‌حاجیله ف گیاه پنیرك.

**نانه‌ڕه‌ق:** له‌ت‌و په‌تی ئیشك‌و سه‌ختی نان ف خرده‌نان خشك.

**نانـه‌ڕه‌قـه:** ۱) نانـه‌ڕه‌ق؛ ۲) چێشتی پارچه‌نانی ڕه‌ق‌و ڕۆن‌و ئاو ف ۱) خرده‌نان؛ ۲) آشی است.

**نانه‌زگ:** نانوزگ ف مزدور با خوراك.

**نانه‌زگێ:** نانه‌زگ ف نگا: نانه‌زگ.

**نانەسك:** نانوزگ، نانەزگ ف نگا: نانوزگ.

**نانەسکیٚ:** نانوزگ، نانەسك ف نانوزگ.

**نانەشان:** سەبەتەی یانی وەك سینی، سەلە ف سبد طبقی.

**نانــەشویٚن:** ۱) شویٚن‌کەوتن بۆ پەیداکردن‌و گرتن؛ ۲) ئیشاعە وەدوی کەسیٚ خستن ف ۱) پی جو یی، دنبال کردن؛ ۲) شایعه به دنبال کسی راه انداختن.

**نانــەقەیسی:** قەمەردین، شەلاٚنی پانەوەکراوی ئیشکەوەکراو لەبەر تاو، خەروا ف لواشك زردالو.

**نانەکۆڵ:** بەکۆڵ‌دادان ف بردوش نهادن.

**نانەلەم:** نانەزگ ف کارگر مزدبگیر با غذا.

**نانەمریچلە:** کوللیٚرەبەرۆن ف گردهٔ روغن‌مال.

**نانەمل:** ناچارکردن ف بەزور وادار کردن.

**نانەوا:** نانکەر ف نانوا.

**نانەواخانە:** دوکانی نان‌پیٚژ ف نانواخانه.

**نانەوایی:** نانەواخانە ف نانواخانه.

**نانەوشکە:** نانەرەقە ف نگا: نانەرەقە.

**نانەوە:** ۱) بەرپاکردن: (ئاژاوە **نانەوە**)؛ ۲) دانان بەدزیەوە: (تەڵە**نانەوە**)؛ ۳) هیٚلکە لەبن مریشکەکورك دانان: (مریشك**نانەوە** کاری منە)؛ ۴) دەبەرچاوگرتن بۆ مەبەستیٚ: (دزیٚك بو لەماڵ**نانەوە**دا وریابو) ف ۱) برپاکردن؛ ۲) چیزی را دزدکی در جایی نهادن مانندتله؛ ۳) تخم زیر مرغ کرچ گذاشتن؛ ۴) زیرنظرگرفتن، در نظر گرفتن برای منظوری.

**نانــەوەوی:** نان‌وخــوان بۆ ماڵی بوك ف غذایی که به خانهٔ عروس فرستاده می‌شود.

**نانــەهەنجیر:** هەنجیری پانەوەکراوی وشکەوەکراو وەك نانەقەیسی ف لواشك انجیر.

**نانەیەك:** ۱) پیٚکــەوەنان: ۲) تیٚــك‌نــان ف ۱) برهــم نهادن: ۲)در هم فروبردن.

**نانی:** ۱) نەی‌هاورد؛ ۲) برادەریٚ کە بۆ نان‌خواردن هەیەو ڕاست نیە ف ۱) نیاورد؛ ۲) دوست نانی نه جانی.

**نانی‌ئیشك:** نان خاڵی ف نان تهی.

**نانی‌ئیشکی:** نان خاڵی ف نان تهی.

**نانی‌بتەرسی:** نان خاڵی ف نان تهی.

**نانی‌بەوشکی:** نان خاڵی ف نان تهی.

**نانیٚ‌پاتی:** نانی بەوشکی، نانی بیٚ‌پیٚخۆر ف نان تهی.

**نانیٚ‌پەتی:** نانیٚ پاتی ف نان تهی.

**نانیٚ‌تەرسی:** نانیٚ پاتی ف نان تهی.

**نانیٚ‌تەندوریٚ:** نانیٚ کە بەتەندوُر برژابیٚ ف نان تنوری.

**نانیٚ‌تیرە:** نانی تیری ف نان لواش.

**نانی‌تیری:** نانی تەنك کە بەتیرۆك پان‌دەکریٚتەوە ف لواش.

**نانیٚ‌چوُچك:** تۆڵەکە، تۆرەکە، نانەحاجیلە ف پنیرك.

**نانیٚ‌چوك:** نانیٚ‌چوُچك ف پنیرك.

**نانیٚ‌دەزی:** نانی کۆنی برشاوی ف نان کهنه و کپك‌زده.

**نانیٚ‌ساجی:** نانیٚ کە بەسیٚلی دەکەن ف نان ساجی.

**نانیٚ‌سیٚلیٚ:** نانیٚ‌ساجی ف نان ساجی.

**نانیٚ‌شڤانی:** دەموُکانە ف مویزك عسلی.

**نانیٚ‌شکەڤا:** ناسکەنان ف نان تُرد و نازك.

**نانیٚ‌قەتش:** بریٚتی لە ژیان بە فەقیری ف کنایه از امرار معاش.

**نانیٚ‌شوانی:** دەموُکانە ف مویزك عسلی.

**نانیٚ‌لەواشە:** نانیٚ گرۆڤەر، کولیٚرەی تەنك ف نان تافتونی.

**نانیٚ‌میٚچکا:** نانەحاجیلە، تۆرەکە ف پنیرك.

**نانیٚ‌میٚزنی:** نانی ئەستوری هەویرهەلاٚتوُ ف نان کلفت.

**نانیٚ‌میٚشا:** شانەهەنگوین ف شانهٔ عسل.

**نانی‌نانی:** برادەری نانی ف دوست نانی.

**نانیٚ‌هلاتی:** نانیٚ کە هەویرەکەی هەلاٚتوە ف نان خمیر برآمده.

**نانیٚ‌هەلتیٚ:** کولیچەی پڕلە گویٚزکراو ف کلوچهٔ آگنه از مغز گردو.

**نانیٚ‌هەنگڤی:** شانەی هەنگوین ف شانهٔ عسل.

**ناو:** ۱) ناف، نام، دروٚشمی ناسینی هەرشتیٚ؛ ۲) دوڕ، مەیان؛ ۳) نا، وشەی قبــوُڵ‌نەکردن‌و حاشا: (چو یەشار؟ **ناو**)؛ ۴) دەنك، کاکڵ: (ئەم گویٚزە **ناوی** تیانەبو، شەلاٚنی خۆی خۆشەو **ناوە**کەشی خۆشە)؛ ۵) هەرچی لەژیٚر تیٚکولٚەوەیە؛ ۶) وشەی دنە، هانە: (**ناو**تیٚدان)؛ ۷) دوٚلاٚش، نای ئاسیاو؛ ۸) مەڵبــەند: (خەڵکی ئەم **ناوە**یە)؛ ۹) ئاخندراوی دوڕشتیٚ: (کــەواکــەت **ناوی** تیانــیە)؛ ۱۰) ماوە، مەودا: (نــاو ئیٚرەو شار دو سەحاتەڕیٚ‌یە)؛ ۱۱) کات، دەم، جار: (**ناو بە ناو** دیٚت)؛ ۱۲) تەقین، تاربــوُن ف ۱) نام؛ ۲) وسط، میان؛ ۳) نه؛ ۴) مغز و هستهٔ میوه؛ ۵) هرچــیزی که زیر پوستــه و پوست قرار دارد؛ ۶) حرف تشجیع؛ ۷) ناوآسیا؛ ۸) منطقه، ناحیه؛ ۹) آگنه؛ ۱۰) مسافت؛ ۱۱) گاه؛ ۱۲) تارومارشدن.

**ناوا:** نابا ف نمی‌برد، گنجایش ندارد.

**ناوابردن:** لەبەین‌بردن، فەوتاندن ف از میان بردن.

**ناوئاخن:** ناواخن ف آگنه.

**ناواخن:** شتیٚ کە ئەخریٚتە دوڕ شتیٚکی‌ترەوە: (**ناواخنی** سەرین توُکە) ف آگنه.

**ناواری:** نەوەد، نۆدانەدە ف عدد نود.

**ناوازە:** ۱) بژاردە؛ ۲) بەتایبەتی ف ۱) برگزیده؛ ۲) بەویژه.

**ناوان:** مەڵبەند ف منطقه.

**ناوبار:** سەربار، ناڤبارك ف اضافه‌بار.

**ناوباژیٚر:** ناوشار ف داخل شهر.

**ناوبانگ:** دەنگ‌وناو ف شهرت.

**ناوبجی:** ناوبژی، ناڤبژی ف میانجی.

**ناوبڕ:** ناڤبڕ ف نگا: ناڤبڕ.

**ناوبراو:** ناڤبری ف نامبرده.

**ناوبڕاو:** لەبیرکراو ف آدم فراموش شده.

**ناوبــردن:** ۱) ناف‌برن، باس‌کردن؛ ۲) بریٚتی لە خراپەگوتنی پاش‌ملە، غەیبەت‌کردن؛ ۳) ناودیاری‌کردن بۆ کاریٚ ف ۱) نام بردن؛ ۲) غیبت

کسی را کردن؛ ۳) نامزدکردن برای کاری.

**ناوبرۆ:** دوڕ هەردوبرۆ ف میان ابروان.

**ناوبڕە:** تیغە، لەمپەر ف تیغە، حاجز.

**ناوبریاگ:** ناڤبری ف نامبردە.

**ناوبڕیاگ:** ۱) ناوبڕاو؛ ۲) ناودێر بۆ کاریێ ف ۱) شخص فراموش شدە؛ ۲) نامزد برای کاری.

**ناوبرێشك:** نان برێشك ف نگا: نان برێشك.

**ناوبژە:** شیلە، ددانی شیری حەیوان ف دندان شیری دام.

**ناوبژە کردن:** کەوتنی ددانی شیلە ف افتادن دندان شیری دام.

**ناوبژی:** ناڤبژی ف میانجیگری.

**ناوبژیکەر:** ناڤبژیکەر ف میانجی.

**ناوبگێر:** ناڤبرن، ناوبردن ف نام بردن.

**ناوبوێر:** لەبیرچوُن یان لەبیرخۆبردنی ناوی کەسێ یا کەسانێ کە بەناو بانـگدەکـرێن: (نـاوی هەمـوانی گوت قەت ناوبوێری نەکرد) ف فراموش کردن یا از قلم انداختن نام کسی یا کسانی که آنها را صدا می کنند.

**ناوبەناو:** جارجارێ، دەمدەمێ، گاگایێ ف گاه گاهی.

**ناوبەین:** مابەین، ماعبەین ف مابین.

**ناوپا:** دوڕ هەردوڕان، ناف گەڵ ف میان دوپا.

**ناوپارە:** بڕایی دوڕئاوایی: (ماڵیان ناوپارەیە) ف وسط جمعیت و شلوغی آبادی.

**ناوپڕ:** ۱) ناوئاخنی دیوار؛ ۲) پێچەوانەی بەتاڵ و پوُچ ف ۱) آکنهٔ دیوار؛ ۲) توپر، مقابل توخالی.

**ناوپشتە:** رەچەڵەك، رەگەز، رەسەن ف اصل، نسب.

**ناو پەل:** ۱) دوڕ دولکەدار؛ ۲) ماوەی ناو دودەستی یەکسم ف ۱) وسط دو شاخە؛ ۲) فاصلهٔ میان دو دست ستور.

**ناوپەلان:** ناوپەلی زۆر ف میان شاخەها.

**ناوپەنچك:** پەردەی ناسکی دەوری ناوزگ ف غشاء، مشیمە.

**ناوت:** ۱) نابێ، ناشێ؛ ۲) ناڤێ تە ف ۱) نمی شود؛ ۲) نام تو.

**ناوتا:** ناڤبار، سەربار ف اضافەبار.

**ناوتـاف:** گونـدێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**ناوتـاق:** ۱) قەمـامـەیێ کە ئەخـرێتە قڵفی جەواڵەوە بۆ بارکردنی دوتا جەواڵ؛ ۲) سەرتاقەی دیوار ف ۱) بند حلقهٔ کنارهٔ جوال؛ ۲) میان تاقچە.

**ناوتــان:** ۱) تیغــەی لەشــوُڵتەنــراو بۆ ژۆری ماڵ؛ ۲) ناڤێ ڤە؛ ۳) مابەین ئێوە ف ۱) تیغهٔ ترکەیی؛ ۲) نام شما؛ ۳) میان شما.

**ناوتش:** شاندان، خستنەبەرچاو، ڕانان ف بەنمایش گذاشتن، نشان دادن.

**ناوتۆ:** ۱) ناو قەدکراو: (تەزبیحەکە دەناوتۆی لێفەکەدا بو)؛ ۲) ناڤێ تە ف ۱) توی لایە؛ ۲) اسم تو.

**ناوتوێ:** ناوتۆی قەدکراو ف در لایە.

**ناوتوێڵ:** ۱) توێڵ، ئەنی؛ ۲) خاڵکوتان لە توێڵی مناڵ ف ۱) پیشانی؛ ۲) خالکوبی پیشانی بچە.

**ناوتێلانە:** جیازی بوُك ف جهیزیهٔ عروس.

**ناوجەرگە:** مەیان، دوڕ ف وسط.

**ناوجەژنان:** مانگی پێش قوربان و دوای شەشەلان ف ماه ذیقعدە.

**ناوجەغز:** دوڕی کۆز ف وسط دایرە.

**ناوجی:** ناوبژی ف میانجیگری.

**ناوجێژنان:** ناوجەژنان ف ماه ذیقعدە.

**ناوجیکەر:** ناوبژیکەر ف میانجی.

**ناوچاو:** ۱) توێڵ، ئەنی، ناوتوێڵ؛ ۲) دوڕچاو: (پوُشێ کەوتوتە ناوچاوم) ف ۱) پیشانی؛ ۲) داخل چشم.

**ناوچاوان:** توێڵ، ئەنی، ناوچاو ف پیشانی.

**ناوچاوان‌پاك:** برێتی لە پیاوچاکی لەخواترس ف کنایە از شخص نورانی.

**ناوچاوان‌ترش:** ڕوگرژ ف ترشروی.

**ناوچاو پاك:** ناوچاوان‌پاك ف شخص نورانی.

**ناوچاوترش:** ناوچاوان‌ترش ف ترشروی.

**ناوچاوترشانن:** ڕوگرژکردن ف ابرو درهم کشیدن، اخم کردن.

**ناوچاوترشاو:** ڕوگرژ ف ترشروی.

**ناوچاوترشیاگ:** ناوچاوترشاو ف ترشروی.

**ناوچاوچەرمگ:** مارو ف پیشانی سفید.

**ناوچاودێز:** ڕوگرژ ف اخمو، ترشروی.

**ناوچاوڕۆشن:** ناوچاوپاك ف شخص نورانی.

**ناوچاوگرژ:** ڕوگرژ ف اخمو.

**ناوچە:** ۱) مەڵبەند، ناو، ناوان؛ ۲) گەروُڵەی ئاش ف ۱) ناحیە، منطقە؛ ۲) گلوی آسیا کە گندم از آن ریزد.

**ناوچەوان:** ناوچاوان، توێڵ، ئەنی ف پیشانی.

**ناوچەوان‌بەیەکادان:** ڕوگرژکردن ف اخم کردن.

**ناوچەوان‌پاك:** ناوچاوان‌پاك ف شخص نورانی.

**ناوچەوان‌ترش:** ڕوگرژ ف اخمو.

**ناوچەوان‌دێز:** ڕوگرژ ف اخمو، ترشروی.

**ناوچەوان‌ڕوُن:** ناوچەوان‌پاك ف شخص نورانی.

**ناوچــەوان‌قوڕقـز:** ۱) ئەنی‌زەق؛ ۲) برێتی لە کلۆڵ و چارەڕەش ف ۱) پیشانی برامدە؛ ۲) کنایە از بدبخت.

**ناوچەوان‌قەشقە:** برێتی لە بدبەخت و چارەڕەش ف کنایە از بدبخت.

**ناوچەوان گرژ:** ڕوگرژ ف اخمو.

**ناوچیا:** ۱) ناوچــەیێ کە لە مابـەینی کێوان‌دا بێ؛ ۲) ناوچـەیەکـە لە کوردستان ف ۱) کوهسار؛ ۲) منطقەای در کردستان.

**ناوچــین:** ۱) قوڕو خشـتـی ئاخـنــدراوی چینـی دیوار؛ ۲) گەڵای قەدکردنەوەی توتن ف ۱) آگنهٔ دیوار؛ ۲) چیدن برگهای وسطی توتون.

**ناوخاڵی:** بەتاڵ، والا، پوُچ ف میان تهی.

**ناوخۆ:** پێچەوانەی دەرەوە: (شەڕی **ناوخۆیە**، وەزیر ی **ناوخۆ**) ف داخل، داخلی.

**ناوخوا:** نامەخوا ف نگا: نامەخوا.

**ناوخوان:** قوڵایی زین، خوانی زین ف گودی زین.

**ناوخوین:** دۆخین، بەنْدۆخین ف بند تنبان.

**ناودار:** ۱) پێچـەوانەی خاڵی، پڕ؛ ۲) ناو لكو پۆپی دار؛ ۳) خاوەن‌ناو، بەناوبانگ؛ ۴) ناولێنراو، بێ‌ناو نیە ف ۱) پر، مقابل تهی؛ ۲) میان درخت؛ ۳) مشهور؛ ۴) نام نهاده شده.

**ناوداروك:** لەو گونـدانـەی كوردستانـە كە بەعسی كاولیان كرد ف روستایی در كردستان كە بعثیان آن را ویران كردند.

**ناودان:** ۱) ناوی خەڵـكو خۆ گوتن: (دەكـەین ناكـەین **ناونادا** كەكێ ئەمەی كردوە)؛ ۲) دنەدان ف ۱) نام كسی را ذكر كردن؛ ۲) تحريك، تشجيع.

**ناودۆك:** داری ناو هەردو لۆلـەپ كە بەسـەر مەشكـەدا دێت ف چوب وسطی كە بر مشك آيد.

**ناودەس:** ۱) ماوەی بەینی دودەستی ئەسپ؛ ۲) بەری دەست، لەپ ف ۱) فاصلهٔ بين دودست اسب؛ ۲) كف دست.

**ناودەست:** ناودەس ف نگا: ناودەس.

**ناودەشت:** ۱) ناڤدەشت؛ ۲) ناوچەیەكی بیست‌گوندی لە كوردستان كە بەعسی وێرانی كرد ف ۱) دشت محصور به كوهستان؛ ۲) منطقه‌ای شامل بيست روستا در كردستان كە بعثيان ويرانش كردند.

**ناودێر:** ۱) ناوبـراو؛ ۲) بەناوبانگ ف ۱) نام نهاده‌شده، دارای نام؛ ۲) شهرت يافته.

**ناوڕاس:** دوڕ، مەیان ف وسط.

**ناوران:** لاڵە، پاڕانەوە ف لابه.

**ناوڕان:** ۱) گەڵ، دوڕ هەردوڕان؛ ۲) لە ناو كەركـەبەزدا ف ۱) ميان هردو ران؛ ۲) در ميان گله.

**ناورانەوە:** ناوران ف لابه‌كردن.

**ناورتە:** تێكەڵ‌پێكەڵ، نارێك ف نامرتّب.

**ناوڕوان:** ۱) مابـەینی دوچۆمان؛ ۲) ناوە بۆ چەند ئاوایی ف ۱) بين دو رودخانه؛ ۲) نام چند آبادی.

**ناوزڕان:** سوكبوون، روسیابوون ف رسواشدن.

**ناوزڕاو:** ئابڕونەماو، روسیا ف رسوا.

**ناوزگ:** ۱) هەرچی لە دوڕ سكدایە؛ ۲) بەزو چەورایی ناو سك ف ۱) احشاء؛ ۲) چربی و پيه توی شكم.

**ناوساجی:** زروبی ف نوعی گردهٔ در روغن سرخ شده.

**ناوسار:** سەر نیای ئاسیاو ف جوی سر ناو آسياب.

**ناوسك:** ناوزگ ف نگا: ناوزگ.

**ناوسێڵ:** ۱) ناوســاجی، زروبی؛ ۲) بەربــەسێڵ، قوڕاو ف ۱) نگــا: ناوساجی؛ ۲) خورشت گوشت و ماست.

**ناوسێڵی:** ناوسێڵ ف نگا: ناوسێڵ.

**ناوشـاخ:** ۱) ناوچیا، مەڵبـەنـدێ لەنـاو كێواندا؛ ۲) مابەینی دوشاخی حەیوان؛ ۳) مێشكی ناو شاخی حەیوان ف ۱) كوهسار؛ ۲) ميان دو شاخ حيوان؛ ۳) مغز شاخ حيوان.

**ناوشار:** ناوەندی بازێڕ، ناو بازێڕ ف داخل شهر، مركز شهر.

**ناوشان:** مابەینی دوشانی بنیادەم ف ميان كتف.

**ناوفلێقان:** ناو پەلی دار ف ميان شاخه‌ها.

**ناوفـەرش:** ۱) مافـوڕێ كە لەنـاوڕاس ڕادەخرێ؛ ۲) پارچەچەرمێ كە دەخرێتە ناو كەوش ف ۱) فرش وسط اتاق؛ ۲) چرمی كە توی كفش پهن كنند.

**ناوقەد:** ۱) ناوڕاسی بەژن، كەمبەر؛ ۲) ناوڕاسی كێو؛ ۳) ناوڕاسی قەدی دار ف ۱) كمر؛ ۲) كمركوه؛ ۳) وسط تنهٔ درخت.

**ناوك:** ۱) ناڤك؛ ۲) دەنكی ناو میوە؛ ۳) ناو ف ۱) ناف؛ ۲) هسته؛ ۳) محتوی.

**ناوكار:** ۱) ناو چینی دیوار؛ ۲) تەریب، تەقەڵی درشتی بەزنجیرە ف ۱) آگنهٔ ديوار؛ ۲) بخيه‌های درشت و زنجيره‌يی در لحاف.

**ناوكبڕ:** كەسێ كە ناوكی زارۆ دەبڕێ ف ناف‌بر.

**ناوك‌بڕین:** برێتی لە تەواوكردنی كار ف كنايه از تمام كردن كار.

**ناوكردن:** ۱) مەنشوربون؛ ۲) مابەین دورخستنەوە ف ۱) شهرت يافتن؛ ۲) فاصله را بيشتر كردن، فاصله‌گرفتن.

**ناوك‌كەوتن:** نەخۆشیەكە دەڵێن ناوك داكەوتوە ف نوعی بيماری شكم كە به ناف افتادگی معروف است.

**ناوك‌گرتنەوە:** ۱) چارەی ناوك‌كەوتن؛ ۲) برێتی لەئازاردانی زۆر ف ۱) معالجهٔ ناف افتادن؛ ۲) كنايه از بسيار آزار رساندن.

**ناوكۆ:** ۱) دوڕ خەرمانی سور؛ ۲) بەش‌نەكراو؛ ۳) ناڤبار، سەربار؛ ۴) دوڕ خەڵكو جەماوەر ف ۱) وسط تودهٔ خرمن؛ ۲) مُشاع؛ ۳) اضافه‌بار؛ ۴) وسط تودهٔ مردم.

**ناوكـۆرەوەبـون:** ۱) لەبیرخـەڵـك‌چونەوە؛ ۲) بێ‌عەولاد مردن ف ۱) فراموش شده؛ ۲) بی وارث مردن.

**ناوكوێربونەوە:** ناوكۆرەوەبون ف نگا: ناوكۆرەوەبون.

**ناوكۆیی:** ناوبەشی، شەریكی ف شركت.

**ناوكە:** ۱) بەردێكە گیای لێ‌دەئاڵێنن گەنمی خەرمانی بەسەردا دەبێژن بۆ بەرەكەت؛ ۲) دەنكی ڕەقی میوە؛ ۳) دەنكی گوڵەبەڕۆژەو كدو؛ ۴) ناوك، ناڤك ف ۱) سنگ زير خرمن كە به نيّت تبرّك با گياه پيچند؛ ۲) هَسته؛ ۳) تخمه؛ ۴) ناف.

**ناوكـەبڕ:** كچێ كە ڕۆژی لەدایك‌بونی بۆ كوڕێك دیاری كراوە ف دختر نوزادی كە او را نامزد پسری كرده‌اند.

**ناوكەبڕە:** ناوكەبڕ ف نگا: ناوكەبڕ.

**ناوكەخۆشە:** دەنكەقەیسی شیرن ف هستهٔ شيرين زردالو.

**ناوكـەڕەشە:** ۱) نەخۆشیەكی یەكسم؛ ۲) ئافاتێكی تورە ف ۱) نوعی بيماری ستور؛ ۲) آفت ترب.

**ناوكەڕێژ:** ناوكەڕەشەی یەكسم ف نوعی بيماری ستور.

**ناوكەڕێش:** ناوكەڕێژ ف نوعی بيماری ستور.

**ناوك‌هاتنەوە:** چاری ناوك‌كەوتن ف جای آمدن ناف افتاده.

**ناوك هێنانەوە:** ناوك گرتنەوە ف جای آوردن ناف افتادە.

**ناوكـێش:** جۆگەی سەرەكی مەرەزە، شەقـەجـۆی مەرەزە ف جوی سرتاسری شالیزار.

**ناوگ:** ناونجی ف میانە.

**ناوگردان:** گوندێكە لە كوردستان بەعسی وێرانی كرد ف از روستاهای ویران شدهٔ كردستان توسط بعثیان.

**ناوگڵ:** ناڤكەل، ناوپا، گەڵ ف وسط رانها.

**ناوگـۆڕك:** ١) ئاگردانی ناو دیوەخـان و مزگەوت؛ ٢) تەختـایی كۆڕو مەجلیس ف ١) آتشدان مجلس؛ ٢) قسمت هموار مجلس.

**ناوگـەڕ:** ١) مابـەینی دو زەمینی شێوەردبـڕاو؛ ٢) جزیركەی چكۆڵەی ناوەڕاستی چۆم؛ ٣) دەشتـایی لەنێوان چیایاندا ف ١) مرز میان دو شخم؛ ٢) جزیرهٔ ماسەای كوچك در میان رودخانە؛ ٣) دشت محصور بە كوهستان.

**ناوگەڕە:** ١) ناوگەڕ؛ ٢) كاكڵ ف ١) مرز میان دوشخم؛ ٢) مغز بادام و...

**ناوگەڵ:** ناوگڵ، گەڵ ف میان هردو ران.

**ناوگیر:** ناوباسكراو ف نام ذكرشدە.

**ناوگین:** ١) مامناونجی، دەستە؛ ٢) ناوڕاس ف ١) میانگین؛ ٢) وسط.

**ناولقان:** دوڕ پەلی دار ف میان شاخەها.

**ناولكان:** ناولقان ف میان شاخەها.

**ناولنگ:** ناوگەڵ ف میان پاها.

**ناولنگان:** ١) ناوگەڵ؛ ٢) تاوە ف ١) میان رانها؛ ٢) تابە.

**ناولەپ:** دوڕدەست ف توی كف دست.

**ناولەپان:** لەناو هەردو دەستاندا ف میان دستها.

**ناولەسەر:** دیاركراو بۆ كارێكی باش ف كاندیدا، نامزد.

**ناولێنان:** ناڤدانین ف نام نهادن.

**ناوم:** ١) ناوی من؛ ٢) نابم: (ناوم بە سەربار بەسەرتانۆ) ف ١) نام من؛ ٢) نمی‌شوم.

**ناومـاچـەك:** لەو گونـدانـەی كوردستـانە كە بەعسی كاولیان كرد ف روستایی در كردستان كە بعثیان آن را ویران كردند.

**ناوماڵ:** ١) كەلپەلی ماڵ؛ ٢) دوڕ زێی مێوینە؛ ٣) ژوری گەورەی خێزان ف ١) اثاثیە؛ ٢) درون شرمگاه مادینە؛ ٣) اتاق بزرگ در خانە.

**ناومان:** ١) ناوی ئێمە، ناڤێ مە؛ ٢) ناو لەبیرنەچونەوە؛ ٣) بەینی ئێمە، لای ئێمـە: (ئـەمڕۆ مەڕۆ لەناومان بە) ف ١) نام ما؛ ٢) نام فراموش نشدن؛ ٣) میان ما.

**ناون:** ناومان ف نام ما.

**ناونان:** ناڤدانین، ناولێنان ف نام نهادن، نامگذاری.

**ناوناو:** ناوبەناو ف گاه‌گاهی.

**ناوناوە:** ناوبەناو ف گاه‌گاهی.

**ناونجی:** مامناونجی ف میانگین.

**ناونوُس:** كەسێ كە سیایی ناوی خەڵك دەگرێ ف نام‌نویس، آمارگر.

**ناونوُسی:** ناو خستنەدەفتەرەوە ف آمارگیری.

**ناونیان:** ناونان، ناڤدانین، ناولێنان، ناودێركردن ف نامگذاری.

**ناونێرك:** ناودۆك ف نگا: ناودۆك.

**ناونێرۆك:** ١) ناونێرك، ناودۆك؛ ٢) ئاوخۆرەوەی دار ف ١) نگا: ناودۆك؛ ٢) آبخورهٔ درخت.

**ناونیرە:** دو قوتەكەی دارە لە ناوەڕاستی نیردا بۆ قایشڕاگرتن ف دو قطعە چوب در وسط یوغ.

**ناونیشان:** ١) شوێن و ناوێ كە پێی بناسرێنەوە؛ ٢) برێتی لە قەدرو رێز لەناوخەڵكا ف ١) نشانی؛ ٢) كنایە از احترام در میان مردم.

**ناونیشانە:** ناونیشان ف نگا: ناونیشان.

**ناوو:** ١) نوێ، نوُو، تازە؛ ٢) هەرئەمەسە ف ١) نو، تازە؛ ٢) همین است.

**ناووناتۆرە:** سەرناوی پیس و ناپەسند ف لقب زشت.

**ناوونیشان:** ناونیشان ف نشانی.

**ناوونیشانە:** ناونیشان ف نشانی.

**ناووردە:** دورمانی زۆر ورد ف دوخت بخیە ریز.

**ناوە:** ١) دەفری قورکێشان؛ ٢) جۆرێ برنج؛ ٣) چرچی لیباس ف ١) ناوهٔ گل‌كشی؛ ٢) نوعی برنج؛ ٣) چین و چروك لباس.

**ناوهانین:** ناوبردن ف نام بردن.

**ناوهاوردن:** ناوهانین ف نام بردن.

**ناوەبەرە:** ١) ئامرازێكە لە ئەسبابی جوُتدا؛ ٢) دەستەكی تامان ف ١) ابزاری در خیش؛ ٢) چوب تكیەگاه دیوار تركەای.

**ناوەجاخ:** ناڕەسەن ف نانجیب.

**ناوەجاغ:** ناوەجاخ ف نانجیب.

**ناوەخت:** بێ‌وەخت ف نابهنگام.

**ناوەڕاس:** ناوڕاس ف وسط.

**ناوەڕاست:** ناوەڕاس ف وسط.

**ناوەڕژن:** پێخۆر ف نانخورش.

**ناوەرۆك:** هەرچی دەناو شتێ‌تردایە ف محتوا.

**ناوەرۆكە:** ناوەرۆك ف محتوا.

**ناوەسار:** سەرناوی ئاش ف جوی بالای ناوآسیا.

**ناوەسەر:** لفكەی دەسماڵی ژنان ف دنبالهٔ سرپوش زنانە.

**ناوەسەرە:** ناوەسەر ف نگا: ناوەسەر.

**ناوەشكێنە:** ئوتو، هەرچی چرچی لیباسی پێ ساف‌بكرێ ف اطو.

**ناوە كرتە:** نەخۆشیەكی ئاژەڵە ف نوعی بیماری گلە.

**ناوە كێش:** كەسێ حەڕی بە ناوە دەكێشێ ف ناوەكش.

**ناوەڵ:** كەویژەی ئاش ف ناوهٔ آسیا.

**ناوەن:** رفێدەی نانكەر ف بالشتك نانوا.

**ناوەنجی:** بەینابەینی، نەزیادنەكەم ف مُتعادل.

**ناوەند:** ناوەڕاستی هەرشتێ ف مركز، وسط.

**ناوەندە:** گوندێكی كوردستانە بەعسی كاولی كرد ف نام روستایی در كردستان كە توسط بعثیان ویران شد.

**ناوەندی:** شتێ كە لە ناوەڕاستا بێ ف مركزی.

**ناوەندیار:** ناوبژیكەر ف میانجی.

**ناوەندێتی:** ١) دەناوەڕاستابوُن؛ ٢) نە زۆر توندڕۆ نە زۆر لەسەرخۆ ف ١)

مرکزیّت؛ ۲) میانەروی.

**ناوەنگی:** ناوەندی [ف] مرکزی.

**ناوەوان:** گەمیوان [ف] ناخدا.

**ناوەوە:** ژوٌرەوە [ف] داخل.

**ناوهێنان:** ناوهاوردن [ف] نام بر زبان آوردن.

**ناوی:** ۱) ناڤێ ڤی؛ ۲) دوژ ئەو [ف] ۱) نام او؛ ۲) توی آن.

**ناوێ:** ۱) نابێ، ناوت، ناشێ؛ ۲) ناخازێ؛ ۳) ئێك ناو [ف] ۱) نمی‌شود؛ ۲) نمی‌خواد؛ ۳) یك نام.

**ناوپایش:** بەرچاودان، رانان [ف] بەنمایش گذاشتن.

**ناوێر:** ناوپڕی دیوار [ف] آگنٔه دیوار.

**ناوێزە:** ناوازە [ف] نگا: ناوازە.

**ناویژ:** خەربەندە، کەردار [ف] الاغ دار.

**ناویس:** ۱) وچخـانـە، حەڵـوەبی؛ ۲) ئۆدەی ژێر زەمین [ف] ۱) انباری خانە؛ ۲) زیرزمین.

**ناوین:** سواق، سواغ [ف] اندایش.

**ناوینەوە:** سواغدان [ف] اندودن.

**ناها:** تشت، شت [ف] چیز، شیء.

**ناهال:** ناحەساوی، نارٚاست [ف] نادرست، ناراست.

**ناهتۆر:** باخەوان [ف] باغبان.

**ناهلیك:** دۆشەك [ف] تشك.

**ناهمێ:** ناهومێ [ف] نومید.

**ناهومێ:** بێ ئومێد [ف] نومید.

**ناهومێد:** ناهومێ [ف] نومید.

**ناهومێدی:** دلساردی لە بەئاوات گەیشتن [ف] نومیدی.

**ناهەق:** نارٚاست، نارٚەوا [ف] ناروا.

**ناهەقی:** زوڵم، ستەم [ف] ستم.

**ناهەموار:** نارێك [ف] ناهموار.

**ناهەنجار:** ناقۆلا [ف] ناهنجار.

**ناهی:** ۱) گیایەکە گوڵی لە ئەستێرە دەکا؛ ۲) ئەستێرە گەشەکە؛ ۳) ناوە بۆژنان [ف] ۱) گیاهی است؛ ۲) ستارۂ سحری؛ ۳) نامی زنانە.

**نای:** بلوٌر، بلوێر، بلوٌل [ف] نی لبك.

**نایاب:** زۆر بەنرخ [ف] بسیار ارزندە.

**نایب:** بریکار، کەسێ کە لەباتی کەسێ‌تر کاروبار بەڕێوە دەبا [ف] نائب.

**نایژە:** ۱) کوٌژە، گەروٌلەی ئاسیاو؛ ۲) جۆرێ بلوێر [ف] ۱) گلوی آسیاب کە گندم از آن ریزد؛ ۲) نوعی نی‌لبك.

**نایژەن:** بلوٌرژەن [ف] نی‌نواز.

**نایسان:** گڕنەگرتن [ف] مشتعل نشدن.

**نایسەر:** ناواییەکە [ف] نام دهی است.

**نایسین:** نایسان [ف] مشتعل نشدن.

**نایە:** ۱) کەیفی لەهاتن نیە، نایێت؛ ۲) بلوێر [ف] ۱) نمی‌آید؛ ۲) نی‌لبك.

**نایەب:** زۆر بەنرخ، نایاب [ف] ارزندە، نایاب.

**نایێ:** ۱) ئەمە، ئائەمە؛ ۲) وازی لەهاتن نیە [ف] ۱) همین؛ ۲) نمی‌آید.

**نابیش:** دانان لەزەوی، نیان وەبان زەمین [ف] بر زمین نهادن.

**نابیش پا:** ۱) چەسپـانـدن؛ ۲) مەیانـدن؛ ۳) وێك کەوتن؛ ۴) تەقاندنی گوللە، پێوەنان؛ ۵) ناوی بەگاڵتەلێ‌نان؛ ۶) پێکردنی ئاگر؛ ۷) داماڵین بەدەست [ف] ۱) چسباندن؛ ۲) بندآوردن توسط مایە؛ ۳) بەهم خوردن، برخـورد؛ ۴) شلیك کردن؛ ۵) لقب مسخـره دادن؛ ۶) روشن کردن آتش؛ ۷) بادست چلانیدن.

**نابیش پرا:** ۱) تەقـانـدنی گوللە؛ ۲) پێکـردنی ئاگروچرا [ف] ۱) شلیك کردن؛ ۲) روشن کردن آتش و چراغ.

**نابیش خۆڤەر:** پێش خەڵك کەوتن [ف] از جلو مردم راەرفتن.

**نابیش ڕۆ:** ۱) ڕۆنـایش، چەقاندنی نەمام؛ ۲) داهێنانەوەی لقی‌دار؛ ۳) بەسـەرعەرزا ڕاکێشانی دار [ف] ۱) غرس نهال؛ ۳) خم کردن شاخۂ درخت؛ ۳) خوابانیدن درخت روی زمین.

**نابیش ڕۆٌ:** نابیش ڕۆ [ف] نگا: نابیش ڕۆ.

**نابیش سەر:** ۱) سەربار؛ ۲) خۆتێ‌هەڵقوتان؛ ۳) هەڵچوٌن لەبەر کوڵین [ف] ۱) سربار؛ ۲) فضولی؛ ۳) سرریزکردن از جوش آمدن.

**نابینە:** ۱) ئائەمانە؛ ۲) ئەوانە [ف] ۱) همین‌ها؛ ۲) اینها.

**نابینەپا:** پێوەنانی گوللە [ف] تیراندازی.

**نابینەڕۆ:** ڕۆنان، دانان لە زەوی [ف] بر زمین گذاشتن.

**نتر:** ۱) چاوەنوٚڕی؛ ۲) گوڵدرون لە قوماش [ف] ۱) انتظار؛ ۲) گلدوزی.

**نتراندن:** ۱) چاوەنوٚڕی کردن؛ ۲) نەخشاندنی قوماش بەهۆی دروٌن [ف] ۱) انتظار داشتن، انتظار کشیدن؛ ۲) گلدوزی کردن.

**نتل:** نەخش [ف] نقش.

**نتلاندن:** نەخشاندن [ف] نقشدارکردن.

نتم: حەوسەلە، سەبر، پشوٌلەسەرخۆیی [ف] شکیبایی.

**نجمی:** شەل، لەنگ، لەپا سەقەت [ف] لنگ.

**نچ:** ۱) دەنگی باریکی کرٚوٌزانەوە؛ ۲) سرتە؛ ۳) سوٌچی لێفەو جلكو... [ف] ۱) نالۂ ضعیف؛ ۲) درگوشی، نجوی؛ ۳) گوشۂ لباس و لحاف و...

**نچار:** بێچارە، داماو، بەلەنگاز [ف] بیچارە، درماندە.

**نچـــك:** ۱) ددان کەوتن؛ ۲) چلوپکی دار [ف] ۱) افتـــادن دنـدان؛ ۲) بالاترین نقطۂ درخت.

**نچە:** ۱) حەچە، دەنگدانی کەر؛ ۲) نچ، دەنگی کزی ناڵە؛ ۳) سوٌکەڵە، کەمـوکە [ف] ۱) حرف راندن الاغ، هین؛ ۲) صدای ضعیف نالە؛ ۳) سبك، اندك.

**نچەتا:** تاو لەرزی سوٌك، سوٌکەڵەتا [ف] تب سبك.

**نچەنچ:** ناڵەناڵی کورت و کز [ف] نالۂ پیاپی با صدای ضعیف.

**نچیر:** راو، راوشکار، ئەو جانەوەرەی لە ڕاو دەگیرێ [ف] شکار، نخجیر.

**نچیرڤان:** راوکەر [ف] صیّاد، شکارچی.

**نچیروان:** نچیرڤان [ف] شکارچی.

**نحۆ:** سوٌکەڵەناوی نوٌح، ناوە بۆ پیاوان [ف] مخفّف نوح، نام مردانە.

**نخ:** بەچۆکاهاتنی حوشتر [ف] بر زانو نشستن شتر.

**نخافتن:** خۆداپۆشین بە لێفە [ف] خود را با لحاف پوشانیدن.

**نخاف:** لێف، لحێف، لیفە، سەرەنداز [ف] لحاف.

**نخاو:** چێشتی تراوی نخه، شۆرباونخه [ف] آش نخود.

**نخای:** بێ‌عه‌ده‌ب، ره‌وشت‌خراپ [ف] بی ادب.

**نختکاپه‌یه‌نیٚ:** گیانه‌لاو، ئاویلکه‌دان [ف] حال نزع.

**نخته:** سه‌ره‌تای باران‌دادان [ف] لحظات شروع ریزش باران.

**نخروٚ:** رۆچوگ، قوم‌بوگ له‌ئاو یان زه‌لکاوا [ف] فرو شده در آب یا باتلاق.

**نخری:** ئێکه‌م‌فرزه‌ند [ف] اوّلین فرزند.

**نخفت:** دای‌پۆشی، شاردیه‌وه [ف] پوشید، پنهان کرد.

**نخفتن:** داپۆشین، وه‌شارتن [ف] پوشیدن، پنهان کردن.

**نخۆ:** نخه [ف] نخود.

**نخوری:** ۱) نخری، ناخوری، نۆبه‌ره؛ ۲) برای گه‌وره [ف] ۱) نوبر؛ ۲) برادر بزرگتر.

**نخۆشه‌ر:** له‌تکه‌نۆك، له‌په [ف] لپه.

**نخوم:** نخون، به‌راوه‌ژوبوگ [ف] سرنگون.

**نخوماندن:** نخون‌کردن، به‌راوه‌ژوکردن [ف] سرنگون کردن.

**نخوُن:** ئاوه‌ژو، قلْپ [ف] نگون.

**نخـه:** دانـه‌وێڵه‌یه‌کی پچوکی خڕی به‌دندوکه ده‌ناو که‌لودا ده‌بێ بۆ زۆر چێشتان به‌کاردێ له ده‌ستاڕ ده‌کرێ‌و نخۆشه‌ری لێ به‌رهه‌م‌دێ، نۆك [ف] نخود.

**نخێڤ:** نخاف، لێف، سه‌ره‌ناز، لێفه [ف] لحاف.

**نخین:** گوڵه‌شللێره [ف] لالۀ سرنگون.

**نرت:** تازه، کارپێ‌نه‌کـراو، ده‌کـارنـه‌کـراو: (که‌واکه‌ت **نرت**و نوێ‌یه بۆ ناته‌وێ) [ف] کارنکرده و نو.

**نرتکه:** سه‌رناوی سوُك‌کردن: (نێوو **نرتکه‌م** لێ‌ده‌نێ) [ف] لفظ و لقب تحقیرآمیز.

**نرت‌ونوێ:** تازه‌و نوێ [ف] کارنکرده و نو.

**نرخ:** بایی، به‌ها، قیمه‌ت [ف] نرخ، قیمت.

**نرخاندن:** قیمه‌ت بۆدانان [ف] ارزیابی.

**نرخ‌بڕین:** نرخاندن، قه‌رساندن [ف] ارزیابی کردن.

**نرخدار:** به‌قیمه‌ت [ف] ارزشمند.

**نرخ‌دانان:** ۱) نرخاندن؛ ۲) قه‌درگرتن [ف] ۱) ارزیابی کردن؛ ۲) ارج گذاشتن.

**نرخـه:** لرچـه، لرخـه، ده‌نـگ له‌سنگه‌وه له ته‌نگه‌نه‌فه‌سی‌و نه‌خۆشی‌و ماندۆبوُن [ف] صدای سینه.

**نردو:** ده‌سته‌نانێکی پێکه‌وه‌پێچراو [ف] نورده از چندتا نان.

**نڕقان:** جمان، بزاو [ف] حرکت.

**نرقه:** لرچه، نرخه [ف] صدای سینه.

**نرکـاندن:** ده‌نگ له سنگ‌و گه‌روُ هێنان [ف] صدا از سینه برون دادن از خستگی، هِن‌هِن کردن.

**نرکانن:** نرکاندن [ف] نگا: نرکاندن.

**نرکه:** ده‌نگ له‌سنگه‌وه له ماندوُبوُن [ف] صدای هِن‌هِن.

**نڕناش:** دێو، دێوه‌لۆکه، جنۆکه‌ی زه‌لامی شاخدار، عیفریت [ف] عفریت.

**نڕه‌نڕ:** حیله‌حیلی ئێستر [ف] شیهۀ استر.

**نریخه:** کوڕژنی ئه‌سب، شیڕه ئیرِی ئه‌سپ [ف] غرش اسب.

**نڕین:** حیلاندنی ئێستر [ف] شیهه‌کشیدن استر.

**نز:** ۱) بێ‌ئابڕو، سوُك له‌به‌رچاوان؛ ۲) نه‌فه‌س، هه‌ناسه: (**نزگه‌ره**) [ف] ۱) بی آبرو؛ ۲) نفَس.

**نزا:** دوعا، داواله‌خوا [ف] دُعا.

**نزاخوان:** دوعاخوێن [ف] دعاخوان.

**نزاخوێن:** نزاخوان [ف] دعاخوان.

**نزار:** ۱) له‌ڕو لاواز، کز؛ ۲) لێڕه‌وار؛ ۳) جێگه‌یه‌ك له به‌رزی شاخ‌و کێودا که به‌رسیبه‌ره‌و که‌متر تاوی لێ‌ده‌دا [ف] ۱) لاغر؛ ۲) جنگل؛ ۳) جای همیشه سایه در کوه.

**نزاره:** له‌و گوندانه‌ی کوردستانه که به‌عسی کاولیان کرد [ف] روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**نزاره‌وا:** پیاوچاك که دوعای قبوُڵ ده‌بێ [ف] مستجاب‌الدّعوه.

**نزاره‌وان:** که‌سێ که ئاگای له لێڕه‌واره [ف] جنگلبان.

**نزارێ:** گونـدێکـه له کوردستـان به‌عسی وێرانی کرد [ف] از روستاهای ویران شدۀ کردستان توسط بعثیان.

**نزاف:** ۱) زنه، جێگه‌ی ئاوده‌ڵێن‌و دایمه‌ته‌ڕ؛ ۲) ئاوی ده‌ڵاو [ف] ۱) جای همیشه مرطوب؛ ۲) آب تراوش شده.

**نزام:** نازانم [ف] نمی‌دانم.

**نزان:** مژده، خه‌به‌ری خۆش [ف] مژده.

**نزانم:** نزام [ف] نمی‌دانم.

**نزانی:** مزگێنی [ف] مژدگانی.

**نزاو:** ۱) نزاف؛ ۲) نه‌دوُر؛ ۳) میوه‌ی ئاوتێگـه‌ڕاو، ئاڵ‌وبـوڵ [ف] ۱) نگا: نزاف؛ ۲) نزدیك؛ ۳) میوۀ نزدیك به رسیدن.

**نزبه:** ره‌زی دێمی تازه‌پێ‌گه‌یشتو [ف] تاکستان دیم نو بنیاد.

**نزدورێ:** له‌و گوندانه‌ی کوردستانه که به‌عسی کاولیان کرد [ف] روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**نزدیك:** نه‌دوُر، نزاو [ف] نزدیك.

**نزدیکان:** ۱) به‌ره‌به‌ره، سه‌رده‌م: (**نزدیکانی ڕۆژئاوا بون**)؛ ۲) نزدیك: (له‌و **نزدیکانه بو**) [ف] ۱) نزدیك به اوان؛ ۲) نزدیك.

**نزدیك‌بوُن:** نه‌مانی دوُری له‌ناودا [ف] نزدیك شدن.

**نزدیك‌بوُنه‌وه:** نزدیك‌بوُن [ف] نزدیك شدن.

**نزدیك‌خستنه‌وه:** دوُرێ به‌ره‌وخۆ ئانین [ف] نزدیك کردن.

**نزدیك که‌وتن:** تخون‌که‌وتن، لێ‌نزیك‌بوُنه‌وه [ف] نزدیك شدن.

**نزدیك که‌وتنه‌وه:** نزدیك‌بوُنه‌وه [ف] نزدیك‌تر شدن.

**نزدیکی:** نه‌دوُری، پێچه‌وانه‌ی دوُری [ف] نزدیکی.

**نزر:** بڕیاردان که به‌مه‌رجێ کار پێك بێ خێرێ بکا، له‌خۆگرتن [ف] نذر.

**نزرگ:** نزگه‌ره [ف] سکسکه.

**نزرگـه:** گۆڕخانه‌ی پیاوی خوا که خه‌ڵك ده‌چنه زیاره‌تی [ف] امامزاده، مزار متبرّکه.

**نزگ:** ۱) نیوه‌هه‌ناسه، هه‌ناسه‌ی کزو سه‌برۆکه له‌نه‌خۆشیه‌وه؛ ۲) ژیان، ژی [ف] ۱) رمق؛ ۲) زندگی.

**نزگره:** حاڵێکە بەسەر گیانـدار دێت هەناسەی بەپڕی سەردەکەوێ و دەنگی هك لە گەروو دێت ف سکسکه.

**نزگەره:** نزگره ف سکسکه.

**نزلە:** سەرمابوونی بەتەوژم کە هازەهاز لەسنگەوە دێت و ئاو لە لووت دەڕژێ ف سرماخوردگی شدید.

**نزم:** ١) پێچەوانـەی بڵند؛ ٢) بێ تاقەت؛ ٣) بێ ئاکارو کەم ئابڕو ف ١) پست، مقابل بلند، کم ارتفاع؛ ٢) ناتوان؛ ٣) دون، بی آبرو.

**نزمان:** شوێنی نزم، پێچەوانەی بڵندایی ف پستی، مقابل بلندی، جای کم ارتفاع.

**نزمایی:** نزمان ف نگا: نزمان.

**نزم بوونەوە:** داکەوتن ف پایین آمدن.

**نزمی:** ١) نەویایەتی؛ ٢) بێ ئاکـاری و بێ ئابڕویی ف ١) مقابل بلندی، پستی؛ ٢) بی آبرویی.

**نزوول:** ١) سووتی پارە؛ ٢) نەخـۆشی نزلـە ف ١) ربـا، بهرهٔ پول؛ ٢) سرماخوردگی شدید.

**نزووڵە:** ١) دوعای بێچارەی هەناسەسارد؛ ٢) هەناسەی سارد ف ١) دعای مستمند؛ ٢) آه سرد.

**نزووڵە:** نزوڵە ف نگا: نزوڵە.

**نزە:** ١) نز، بێ ئابڕو، بێ فەڕ؛ ٢) شنە، سروە ف ١) پست فطرت؛ ٢) نسیم.

**نزەبا:** شنەبا، شیبا، سروە، کزەبا، بای بسکان ف نسیم.

**نزیك:** نەدور، نزدیك ف نزدیك.

**نزینگ:** نزیك ف نزدیك.

**نژ:** شفرەی برین دڕین ف نیشتر.

**نژار:** ١) سەنگ چن، بەکوچك هەڵچنینی دیوار: (بیرەکەی **نژار** کرد)؛ ٢) جێگای تەنیاوبێ هەرا ف ١) سنگچین؛ ٢) جای دنج.

**نژاندن:** دانانی دیوار لە وشکەبەرد ف بنای دیوار از سنگ بدون ملاط.

**نژتەر:** نشتەر، نەشتەر، نژ ف نشتر.

**نژتەرکرن:** خوێن بەردان، حەجامەت ف حجامت.

**نژد:** زام، برین، کوان ف زخم.

**نژدار:** بژیشکی برینان ف جرّاح.

**نژداری:** کاری بژیشکی برین دڕ ف جرّاحی.

**نژدۆ:** ناوە بۆ پیاوان ف نام مردانه.

**نژدە:** ١) تەریدە، دەستـەی ڕێگـران؛ ٢) تاڵانکـەر؛ ٣) **ئەوانەی شوێن** ڕێگران دەکەون بۆ کوشتن و گرتنیان ف ١) دستهٔ راهزنان؛ ٢) غارتگر؛ ٣) دستهٔ دزدبگیران.

**نژدی:** ١) ئەسپی کلك قەیچی کراو؛ ٢) نژدە ف ١) اسب دم قیچی شده؛ ٢) نگا: نژده.

**نژم:** قەڵافەت، تەحر و دیدار، بیچم ف ریخت و قیافه.

**نژم شۆڕ:** ڕوگرژ ف اخمو.

**نژن:** ١) تـژە، پڕ، دارمـاڵ؛ ٢) ئیشکەکەڵـەك ف ١) پُـر، مالامال؛ ٢) سنگچین.

**نژاندن:** پڕ و دارماڵ کردن ف مالامال کردن.

**نژنی:** تەون، تەنین ف بافندگی.

**نژنیت:** نژنی ف بافندگی.

**نژنین:** ١) بەرد لەسـەریەك چنین، بۆ سەنـگ چنی کوڵی بەزدەڵێن؛ ٢) پڕبوون ف ١) سنگچینی آبشخور؛ ٢) پُرشدن.

**نژوە:** لەبەر گوتە نووسینەوە ف املاء.

**نژی:** مێژوێ ف عدس.

**نژیار:** خانوی سەنگ چن ف خانه از سنگ بدون گل.

**نژیارڤان:** ئەندازیاری خانوان ف مهندس معماری.

**نسـار:** ١) شوێنێ کە تاو نایگـرێتـەوە، بەرسێبـەر؛ ٢) سێبـەر ف ١) آفتاب نگیر، جای همیشه سایه؛ ٢) سایه.

**نسـارە:** ١) نەخشی بەدارچین لەسەر فرنی؛ ٢) پوڵ هەڵاویشتن بەسەر بووکا ف ١) نقش دارچین روی فرنی؛ ٢) پول سکه بر سر عروس ریختن.

**نست:** پێچـەوانـەی بوون: (هەست و **نستی خۆم دایە**) ف نیست، نبود، مقابل بودن.

**نستەن:** ڕوونیشتن، نیشتن ف نشستن.

**نستەنە:** رونین، دانیشتن، ڕوونیشتن ف نشستن.

**نسحەت:** ئامۆژگاری، پەند ف اندرز.

**نسرم:** نسار، نزار ف نگا: نسار.

**نسرێ:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**نسك:** ١) نژی، مێـژوێ؛ ٢) فەقیر، بێ ماڵ؛ ٣) بێچارە و هەناسەسارد؛ ٤) ژیان ف ١) عدس؛ ٢) ندار، بینوا؛ ٣) بیچاره؛ ٤) زندگی.

**نسکۆ:** ١) ڕەت، سەرسم؛ ٢) هەڵەنگوتن ف ١) تلو؛ ٢) سکندری.

**نسکوناهومێ:** لێ قەوماوی بێچارە ف مصیبت زده و بیچاره.

**نسکە:** نزگەرەی دوای گریانی زۆر ف سکسکه در اثر گریهٔ بسیار.

**نسکیان:** نزگەرە کردن لەگریانەوە ف سکسکه کردن از گریه.

**نسکین:** شێوی نسك، چێشتی نژی ف آش عدس.

**نسکێنە:** نسکین ف آش عدس.

**نسگەرە:** نزگەرە ف سکسکه.

**نسلین:** پسان ف گسستن.

**نسێ:** ١) سێبەر؛ ٢) نسار ف ١) سایه؛ ٢) جای آفتاب نگیر در کوه.

**نسیب:** ١) بەش؛ ٢) بەخت ف ١) بهره؛ ٢) شانس.

**نسیس:** کەشاو، ئاودانی زەوی بەرلە چاندن ف آبیاری زمین قبل از کشت.

**نسیبەت:** مسیبەت ف نگا: مسیبه‌ت.

**نسیو:** نسیب ف نگا: نسیب.

**نسیە:** زەوی کەم دەرامەد ف زمین کم حاصل.

**نش:** گزوگومەت، نەکاو ف ناخودآگاه، ناگهان.

**نشـاستـە:** گوشـراوی ئاردەبـەهـاروی دەئـاوکـراوی پاڵێوراو کە وشك دەبێتەوە ف نشاسته.

**نشـــایش:** ۱) نیشتنـەوەی باڵـدار؛ ۲) هاتنـەژێر لەسـەرڕا؛ ۳) ئارامو ئۆقرەگرتن ف ۱) بر زمین نشستن پرنده؛ ۲) فرودآمدن؛ ۳) آرام گرفتن.

**نشت:** نزم‌بوونەوە، هاتنەخوار ف پایین آمدن، بەپایین گراییدن.

**نشتاو:** پاشاوی ئاودێری ف پسابۀ آبیاری.

**نشتاین:** سواربوون، چوونەسەر خوانەزین ف سوار اسب شدن.

**نشتش:** ۱) نیشتنەوەی باڵدار؛ ۲) هاتنەخوار لە باڵاوە؛ ۳) ئۆقرەگرتن؛ ۴) ڕۆنیشتن، هەدادان؛ ۵) نوستن، خەفتن، رازان؛ ۶) وێك‌کەوتن، نوُسین ف ۱) و ۲ و ۳) نگا: نشایش؛ ۴) نشستن؛ ۵) خوابیدن؛ ۶) برخوردکردن.

**نشتش پا:** ۱) چوارمێردەکی ڕۆنیشت؛ ۲) بەزەمینەوە چەسپا ف ۱) چهار زانو نشست؛ ۲) بەزمین چسبید.

**نشتش‌جْ:** سوارئەسپ بوُن ف سوار اسب شدن.

**نشتش‌ڕۆ:** ۱) سەرجینچـەك نیشتن، هەڵتـروشکـان؛ ۲) چوونـەسـەر ئاودەست ف ۱) چمباتمەزدن؛ ۲) دستشویی رفتن.

**نشتش‌روُی:** نشتش‌ڕۆ ف نگا: نشتش‌ڕۆ.

**نشتش‌وْ:** سوارئەسپ‌بوُن ف سوار اسب شدن.

**نشتمان:** ۱) جێگەی ڕۆنیشتن؛ ۲) جێگەی لێ‌ژیان ف ۱) جای نشستن؛ ۲) جای زیستن، وطن.

**نشتن:** ۱) دابەزینەسەرزەوی باڵدار؛ ۲) ڕۆنیشتن، دانیشتن، ڕۆنین؛ ۳) تڵـە چوُنـەژێری دەفرەوە؛ ۴) کەم‌کردنی بارستایی ئاو: (ئاوی لافاو **نشتـوە**)؛ ۵) ئاوابـوُنی خۆر: (خۆرەکە **نشت**)؛ ۶) چوُنەسەر بێشاو، ریان: (هـەر خوێن **نشتـوە**) ف ۱) فرود آمـدن پرنـده بر زمین؛ ۲) نشستن؛ ۳) رسوب؛ ۴) فرونشستن سطح آب؛ ۵) غروب؛ ۶) ریدن.

**نشتو:** دوعای نوسراو ف دعای نوشته.

**نشتەجێ:** نیشتەجێ، دامەزراو لە شوێنێك ف مقیم.

**نشتەنە:** دانیشتن، نیشتن، رونین ف نشستن.

**نشتەنەرو:** سواری ئەسپی بەزین‌بوُن ف بر اسب زین شده سوار شدن.

**نشتێر:** نژد، نشتەر، نەشتەر ف نشتر.

**نشخۆر:** قەسەڵی ئاخوڕ، پاشاخوڕ ف پس مانده در آخور.

**نشدار:** نژدار، برینگەر، بژیشکی برینان ف جرّاح.

**نشر:** قەی، لەدەمەو هاتگ ف قی.

**نشراندن:** ڕشانەوە، هەڵهاوردن ف قی کردن، بالاآوردن.

**نشرین:** نشراندن ف قی کردن.

**نشس:** ۱) کەم‌بوُنی قەدرو ڕێز؛ ۲) زیان کردن لەژیانـا ف ۱) کم شدن احترام؛ ۲) زیان دیدن در زندگی.

**نشست:** نشس ف نگا: نشس.

**نشستی:** نشس: (هـەرکـەس بکـا بێگانەپەرستی ئاخری هەر ئەهێنێ **نشستی**) ف نگا: نشس.

**نشف:** ۱) چینێك لە بەرهەمی زەوین؛ ۲) نهۆم، قات ف ۱) بار حاصل از محصول زمین؛ ۲) طبقه، اشکوبه.

**نشفێ‌داوی:** ۱) پاشەبەر، دوامین بەشی بەرهەم؛ ۲) نهۆمی هەرەباڵا ف ۱) آخرین بار از محصول؛ ۲) بالاترین طبقۀ ساختمان.

**نشقین:** زیڕاندن ف جیغ کشیدن.

**نشك:** لەپڕ، کتوپڕ، گزوگومەت ف یکهو، ناگهانی.

**نشکا:** نشك ف یکهو.

**نشکاف:** نشك ف نگا: نشك.

**نشکافك:** لەپڕ، ناخلاف ف ناگهانی.

**نشکافی:** ناخلاف ف ناگهانی.

**نشکن:** دیواربڕ، ئاسنی دەستی دز بۆ دیواربڕین ف ابزار دیوار سوراخ کردن دزد.

**نشکنین:** دیواربڕین ف دیوار سوراخ کردن دزد.

**نشکێقە:** گزوگومەت، لەپڕا ف ناگهانی، یکهو.

**نشمی:** چەپەڵ‌خوەر، دژخۆر ف کثیف در غذاخوردن.

**نشو:** خاڵ لەسەرپێست ف خال روی پوست.

**نشوف:** لێژ، سر بەرەژێرە ف نشیب.

**نشوُف:** زنار، هەڵەت، ماە، هەڵەموت، هەزاربەهەزار ف پرتگاه.

**نشوُك:** توتنی زۆرکوتراوی تاڵەبێژکراو کە بازیّ کەس تەیکەنە لوتیانۆ ف انفیّه.

**نشیان:** مۆرو ناو بەقاقەزەوە، ئیمزا ف مهر و امضاء بَر سَنَد.

**نشیف:** ۱) سەربەرەژێرە، بەرەوخوارە، لێژایی؛ ۲) باشوور، لای قوبلە ف ۱) نشیب؛ ۲) جنوب.

**نشیمەن:** نشتمان ف نگا: نشتمان.

**نشیمەنگا:** نشیمەن، نشتمان ف نگا: نشتمان.

**نشین:** ۱) پاشگری بەمانا جێگەی دانیشتن: (خواجا**نشین**، میر**نشین**، شا**نشین**)؛ ۲) کەسێ کە لەجێگـەیەك دادەنیشێ: (دێ‌**نشین**، کرا**نشین**، سەر**نشین**) ف ۱) پسوند به معنی جای نشستن؛ ۲) کسی که در جایی نشیند.

**نشینگە:** ۱) جێگەی نیشتنی مەل؛ ۲) جێگەی دانیشتن؛ ۳) نیشتمان ف ۱) محل فرود پرنده؛ ۲) جای نشستن؛ ۳) میهن.

**نشینە:** لیس بۆ بازو مەلی ڕاوکەر ف جای مخصوص نشستن پرندۀ شکاری.

**نشیو:** نشیف، لێژ، سەربەرەژێرە ف نشیب.

**نشێو:** نشیف، لێژ، نشیو ف نشیب.

**نشیوی:** لێژی ف نشیبی.

**نغرۆ:** ۱) بەعەرزاڕۆچوُگ؛ ۲) زەمینی ڕۆچوُگ ف ۱) فرورفته؛ ۲) زمین فرورفته.

**نفت:** ۱) نرت، جلی کارنەکردوی تازە: (کراسەکەت **نفت‌ونویّ**یە)؛ ۲) چلێسی، زگ‌لەوەڕێنی؛ ۳) چوکڵەگۆگرد، چلەشخاتە ف ۱) لباس نو کارنکرده؛ ۲) شکم‌پرستی؛ ۳) چوب کبریت.

**نفتـك:** ۱) کفتـك، کوتیلك، کفتـە؛ ۲) شەمچـە، شقـارتە ف ۱) کوفتۀ خوراکی؛ ۲) کبریت.

**نفتونویّ:** تازەو کارنەکردو ف کارنکرده و تازه.

**نفته‌ك:** شه‌مچه، كرمیت، شقارته، شخاته ف كبریت.

**نفر:** توُك، دوعای خراپ ف دعای بد، نفرین.

**نفردی:** مجوڕكدان‌و له‌رزینی سوُك ف فراشا.

**نفره:** ۱) نفر، توُك؛ ۲) ده‌ركراو به‌سوُكی له ناو كوّمه‌لّ: (**نفره بو یه**) ف ۱) دعای بد؛ ۲) رانده‌شده از جامعه.

**نفرین:** نفر ف نفرین.

**نفز:** ۱) نزم، نه‌وی؛ ۲) به‌دئاكار، بیّ‌آبرو ف ۱) پست، مقابل بلند؛ ۲) بدكردار.

**نفسی:** جاوی سفت‌و سوّلّ ف متقال.

**نفش:** ۱) توّره‌مه، به‌ره؛ ۲) نه‌وع، جوّر ف ۱) نسل؛ ۲) نوع.

**نفوُرات:** ۱) بزوّزو به‌زیان، به‌دفه‌ڕ: (منالّه‌كان **نفوُراتیكن** هه‌ر مه‌پرسه)؛ ۲) سه‌یر و سه‌مه‌ره ف ۱) بی‌آرام زیان‌رسان؛ ۲) عجیب و غریب.

**نفوُس:** ۱) ودم‌و شوُمی قسه‌ی كه‌سێك: (**نفوُسی** پیسه نه‌خوّشی خستم، **نفوُس**‌پاكه هاته‌سه‌رم چاكی كردمه‌وه)؛ ۲) ژماره‌ی بنیاده‌م له‌ولاّتێك‌دا: (**نفـوُس** ئه‌م دێیه سه‌دكه‌سه) ف ۱) خجستگی و نحسی نَفَس؛ ۲) تعداد نفوس.

**نڤ:** خه‌و، نوستن ف خواب.

**نڤا:** خه‌وت، نوست، ژازا، خه‌فت ف خوابید.

**نڤات:** له‌خوّدان، سه‌روسنگ به‌له‌پی‌ده‌ست كوتان ف سر وسینه‌زنی.

**نڤار:** نوّژه‌ن، تازه‌داهاتگ ف اختراع جدید.

**نڤان:** ۱) خـه‌وتن؛ ۲) كـاری قوّره‌كـاری ف ۱) خوابیـدن؛ ۲) كار گِل‌كاری.

**نڤاندن:** ده‌خه‌وكردن، خه‌واندن ف خواب كردن، خوابانیدن.

**نڤانی:** كاركردن له‌خانودروست‌كردنا ف كار در عمل بناسازی.

**نڤت:** ۱) خه‌فتگ، نوستو، خه‌وتو؛ ۲) بێ‌بره‌و، كه‌ساد ف ۱) خوابیده؛ ۲) كساد، بی‌رواج.

**نڤرشت:** دوعای نوسراو، نشتو ف دعای نوشته.

**نڤز:** نفز ف نگا: نفز.

**نڤژاندن:** به دار شل‌وكوت كردن ف به شدّت كتك زدن.

**نڤست:** خه‌وت، خه‌فت، نوست ف خوابید.

**نڤستاندن:** نڤاندن ف درخواب كردن، خوابانیدن.

**نڤستن:** خه‌وتن، خه‌فتن ف خوابیدن.

**نڤستی:** خه‌فتگ ف به‌خواب رفته، خفته.

**نڤشت:** نڤرشت، دوحای نوسراو، نشتو ف تقوید، دعای نوشته.

**نڤشتوّك:** نڤرشت ف دعای نوشته.

**نڤشتی:** نڤرشت ف دعای نوشته.

**نڤشتی‌لوّك:** گیایه‌كه ف گیاهی است.

**نڤشك:** كه‌ره، روّنه‌كه‌ره، ژوّنی هێشتا قالّ‌نه‌كراو ف كرهٔ حیوانی.

**نڤێژ:** مێژ، پینج‌فه‌رزه‌ی ئاینی موسولّمانان له‌ژوّژو شه‌ودا ف نماز.

**نڤێژابارانێ:** نویژه‌بارانه ف نماز استسقا.

**نڤێژبه‌ر:** پێش‌نوێژ، ئیمام ف پیشنماز.

**نڤێژكه‌ر:** كه‌سێ‌كه نوێژان ده‌كا ف نمازگذار.

**نڤێژگه:** مزگه‌ت، مزگه‌فت، مزگت ف مسجد.

**نڤیس:** ۱) پاشگـری به‌واتـا: خه‌ت‌له‌قاقه‌زده‌ر؛ ۲) پاشگر به‌واتا: وینه له‌خه‌ت‌دراو گرتنه‌وه: (ڤێ نامێ پاك**نڤیس** كه) ف ۱) پسوند فاعلی نویس؛ ۲) پسوند به معنی نوشتن.

**نڤیسار:** كه‌سێ كه به قه‌لّه‌م كار له‌سه‌ر قاقه‌ز ده‌كا ف نویسنده.

**نڤیسان:** قه‌لّه‌م به‌سه‌رقاقه‌زدا هێنان ف نوشتن.

**نڤیساندن:** نڤیسان ف نوشتن.

**نڤیستن:** نوسین ف نوشتن.

**نڤیسك:** به‌لّگه‌ی نوسراو ف سند، مدرك.

**نڤیسكی:** به‌رانبه‌ری لێڤكی، وه‌رامی به‌نوُسین ف پاسخ كتبی.

**نڤیسگه:** پرسگه له‌دام‌وده‌زگای میریدا ف اطلاعات اداره.

**نڤیسه‌ڤان:** نوُسه‌ر، قه‌ره‌م‌به‌ده‌س ف نویسنده.

**نڤیسین:** نڤیسان ف نوشتن.

**نڤیشتیلوّك:** گیایه‌كه. *ترك بێ‌نێژن جانتای شوان* ف گیاهی است.

**نڤیشك:** كه‌ره، روّنه‌كه‌ره، روّنی قالّ‌نه‌كراو ف كره.

**نڤین:** كه‌ل‌په‌لی خه‌وتن ف رختخواب.

**نڤین‌پوُش:** سه‌ره‌نناز، لحێف ف لحاف، پتو.

**نڤینوّ:** سه‌ره‌نناز ف لحاف، پتو.

**نڤینوّك:** قه‌ره‌وێلّه، ته‌ختی‌خه‌وی دوكه‌سه ف تختخواب دونفره.

**نق:** ۱) قوُلاّیی ئاو: (له گوّمێكی **نقا** مه‌له‌م كرد)؛ ۲) داخستن‌و لێك‌نان. بوّ *ده‌س‌و قنگ‌و چاو نه‌گوتریّ*. قوچاندن؛ ۳) بوّلّه‌و پرته: (**نقه‌نق** به‌سه)؛ ۴) پڕایی‌و قه‌لّه‌بالّغ: (*بازاڕ نه‌مڕوّ نق بو*)؛ ۵) خوسته، خوست، وسته؛ ۶) ده‌نگی ته‌وژم‌له‌خـوّدان: (**نقه‌نقیه‌تی**) ف ۱) عمق آب، ژرفا؛ ۲) بستن و برهم نهادن اندامها مانند دست و چشم و...؛ ۳) غرولند؛ ۴) انبوهی و شلوغی؛ ۵) كمترین صدا؛ ۶) صدای زورزدن.

**نقار:** دلّڕه‌نجان، گله‌یی، قار: (**نقارێكی** به‌رانبه‌ر من هه‌یه) ف قهر، رنجش.

**نقارم:** ناتوانم، له‌تاقه‌تمدا نیه ف نتوانم

**نقاری:** ناتوانی، له‌تابشتـدا نیه ف نمی‌توانی.

**نقارین:** له‌ده‌س‌نه‌هاتن، توانای كارێ نه‌بوُن ف نتوانستن، از دست برنیامدن.

**نقام:** ۱) قام، گوّرانی؛ ۲) ره‌وتی گوّرانی ف ۱) ترانه؛ ۲) آهنگ.

**نقـانـدن:** ۱) له خوّڕێك‌كوشین‌و زوّرهێنـان ده‌نگ له‌گه‌روُده‌رچوُن؛ ۲) پێكـه‌وه‌نـانی ده‌ست‌و قنـگ‌و چاو: (**چاوی نقاندوه، قنگی نقاندوه، ده‌ستی نقاندگه**) ف ۱) صدا از گلودرآمدن در اثر زورزدن؛ ۲) برهم نهادن دست و مقعد و چشم.

**نقانق:** پڕاوپڕ ف مالامال.

**نقانن:** نقاندن ف نگا: نقاندن.

**نقتك:** دوامین هه‌ناسه ف نفسهای آخر.

**نقته:** خالّ، ده‌نك له‌نوسینا ف نقطه.

**نقتـه‌بـانگ:** نیشانه‌ی سه‌یرمان‌و له‌گه‌ل‌بوُن، «!» ف علامت تعجّب و خطاب، «!».

**نقتەبهنۆك:** نیشانەی نێوانو بەسەرگرتنەوە، «،» ف ویرگول، کاما، «،».
**نقتەجۆت:** نیشانەی بادانەوە، «:» ف دونقطه، علامت توصیف، «:».
**نقتەپرس:** نیشانەی پرسیار لە نوسینا، «؟» ف علامت سؤال، «؟».
**نقتەشانی:** دەنکی سەرپیتان ف نقطۀ حروف.
**نقر:** ١) نێوانددانەی هەرەو شانە؛ ٢) نێوانپلەی پەیژەو پلەکان؛ ٣) نێوان پلەکـانی سەرمـاوگەرمـاپێو؛ ۴) تیسـك لە کولکـەو مو ف ١) میان دنـدانـەهای ارّە و شانە؛ ٢) میان پلّەهای نردبام و پلکان؛ ٣) فاصلۀ درجات دماسنج؛ ۴) کمکی از مو و پشم.
**نقراندن:** ١) پلەبۆدانان؛ ٢) نرخاندن ف ١) درجەبندی؛ ٢) ارزیابی.
**نقـرنقـر:** ١) پلەپلە؛ ٢) داری لەلـەکـراو ف ١) مُدرّج؛ ٢) چوبدستی کندەکاری شدە.
**نقرە:** تیان، تیانە، قازان، بەرۆشی مەزن ف دیگ بزرگ.
**نقك:** مرۆی بە بەهانە ف بهانەگیر.
**نقم:** چوُنەژێرئاو، کەوتنەژێرئاو، لەبنئاودا گومبوُن ف بە زیر آب رفتن.
**نقن:** کەسێ کە زۆر نق دەکاو دەبۆلێنێ ف غرولندکن.
**نقۆ:** نقم ف زیر آب شدن.
**نقوُ:** نقۆ، نقم ف غوطەورشدن.
**نقۆت:** قلّپ، وەرگەڕاو، سەرنخون ف سرازیر، وارونە.
**نقوُت:** دلۆپە، تنۆك ف چکە.
**نقوُتاندن:** دلۆپەدادان، تنۆکەکردن ف چکەکردن.
**نقوج:** نقورچك، لێڕەبادان ف نشگون.
**نقوُج:** نقوج ف نیشگون.
**نقـوجڕ:** نیخەنیخ لە ڕاکێشانو بارکردنی شتی گران ف نکیدن از حمل چیز سنگین.
**نقوچ:** نقوج ف نشگون.
**نقوُچاندن:** نقورچك گرتن ف نشگون گرفتن.
**نقورچ:** ١) قورنج؛ ٢) سیخورمە ف ١) نیشگون؛ ٢) سقلمە.
**نقورچك:** نقورچ ف نگا: نقورچ.
**نقـورە:** گونـدێکـە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدۀ کردستان توسط بعثیان.
**نقوستان:** سەقەت ف ناقص العضو.
**نقۆك:** ١) ماسیزل کە هەمیشە لەژێر دەریادایە؛ ٢) ژێردەریایی ف ١) ماهی بزرگی کە همواره زیرآب است؛ ٢) زیردریایی.
**نقول:** کون، قول، کونا ف سوراخ.
**نْقولّ:** شیرنیات، نوقلّ: (لەباتی دەنکێ **نْقولّ** زەردەخەنەی لێوی گولّ) ف نُقل.
**نقوم:** قوم، نقم، نقۆ ف زیرآب شدن.
**نقە:** ١) دەنگی زۆربۆخۆهێنان؛ ٢) کەمترین‌دەنگ؛ ٣) جۆرێ ماسی ف ١) صدای زورزدن؛ ٢) کمترین صدا؛ ٣) نوعی ماهی.
**نقیان:** قوُچان، چوقان ف برهم نهادن و بستن اندامها.
**نقیم:** قاشەنەنگوستیلە ف نگین.
**نقێم:** نقیم ف نگین.

**نك:** ١) کن، جەم؛ ٢) وردی ئالاێژکراوی نەرم؛ ٣) دندوُك؛ ۴) دەنگی کزی نالّە؛ ۵) بێچارە، هەناسەسارد ف ١) نزد؛ ٢) ساییدۀ نرم شدە؛ ٣) منقار؛ ۴) صدای نالۀ ضعیف؛ ۵) بیچارە.
**نکا:** ١) مارەبڕین؛ ٢) مارەبڕانە ف ١) عقدنکاح؛ ٢) مهریە.
**نکارم:** ناتوانم، لەدەستم نایە ف از دستم برنمی‌آید.
**نکارن:** ١) ناتوانن: (ئەڤ **نکارن**)؛ ٢) ناتوانین: (ئەم **نکارن**) ف ١) نتوانند؛ ٢) نمی‌توانیم.
**نکال:** لا، تەرەف: (لە چارنکالا خۆ نهیری) ف طرف، جانب.
**نکاندن:** نالاندنی سوُك لەبن‌بارا یان لەبەر نەخۆشی ف نکیدن، نالیدن خفیف.
**نکانن:** نکاندن ف نگا: نکاندن.
**نکاو:** گزوگومەت، لەپڕ ف ناگهان، یکهو.
**نکای:** ١) تائێستاش؛ ٢) هەرچۆنێك‌بێت ف ١) هنوزهم؛ ٢) درهرحال.
**نکاین:** هەرئێستاکێ، هەمانهۆ ف همین حالا.
نکتە: قسـەی خۆش، پێکەنۆك ف لطیفە.
**نکتەبێژ:** قسەخۆش، گالّتەبێژ ف لودە.
**نکتەزان:** زۆرزان لەقسەی جەفەنگیدا ف طنزگو.
**نکس:** ١) وەرگەڕان؛ ٢) شوڕەوەبوُن ف ١) بازگشت؛ ٢) فروهشتەشدن.
**نکساندن:** ١) گـەڕاندنەوە؛ ٢) شوڕەوەکـردن ف ١) برگرداندن؛ ٢) فروهشتن.
**نکسین:** ١) بەپاشدا وەرگەڕان؛ ٢) شوڕەوەبوُن ف ١) بە عقب برگشتن؛ ٢) فروهشتەشدن.
**نکل:** دەنوُك، دەندوُك، نك، دندوُك ف منقار.
**نکلاندن:** بەدەندوُك لێدان ف منقارزدن.
**نکلدەر:** کون‌کونی جێ‌دەندوُك ف سوراخهای جای منقار.
**نکل‌ونکین:** دوفریشتەی خوا کە تازەمردگان بەپرسیاران ئەدەن ف نکیر و مُنکر.
**نکن:** کەسێ کە زۆر نکە دەکا ف نالان.
**نکوچك:** نقورچ، نقورچك ف نگا: نقورچ
**نکول:** نکل، دندوُك ف منقار.
**نکوُل:** پەژیوان لە بەلّێن ف پشیمان از قول.
**نکوُلی:** پەژیوانی لە گفتو بەلّێن ف پشیمانی از قول.
**نك‌ونالّ:** نالّەی کەمو زۆر، نکەی سەبر و بەرز ف نالەهای آهستە و پیاپی.
**نك‌ونالّە:** نك و نالّ ف نالەهای آهستە و پیاپی.
**نك‌وناهومێ:** بێچارەو خاکەسەر ف بیچارە و بدبخت.
**نك‌وناهومێد:** نك‌وناهومێ ف بیچارە و بدبخت.
**نکونەوە:** نت‌ونوێ، نفت‌ونەو ف کاملاً تازە و نو.
**نکە:** دەنگی نەفەس‌تەنگی شەکەتو لەش‌بەبار ف هِن هِن خستە و بیمار.
**نکەنْك:** نکەی زۆر ف هِن‌هِن پیاپی.
**نکین:** ١) نالّین، نالاندن؛ ٢) نکەی زۆرو بەدوی‌یەکدا ف ١) نالیدن؛ ٢) نالەهای پیاپی و کوتاه.

**نگ:** ١) لاق، پا، لنگ: ٢) جیّ‌سیّرەی‌چەكی گەرم ف ١) پا؛ ٢) مگسك اسلحه.

**نگا:** ئاگالیّ‌بوُن ف نگهداری، حفظ، مواظبت.

**نگادار:** كەسیّ كە ئاگاداری كەسیّ یا شتیّكە: (خوا **نگادارت** بیّ) ف مواظب، نگهدار.

**نگاداری:** ئاگالیّ‌بوُن، پارازتن ف نگهداری.

**نگار:** ١) خەت‌دان‌و چنینی شتی جوان، نەخش؛ ٢) ناوی‌ژنانە ف ١) نقش ونگار؛ ٢) نام زنانه.

**نگارە:** ویّنە، شكلّ ف شمایل.

**نگـارین:** ١) شكـلّ كیّشان؛ ٢) نەخشاو، رەنگاورەنگ كریاگ ف ١) نقاشی؛ ٢) مُنقّش.

**نگاهیّشتن:** نگاداری كردن، ئاگالیّ‌بوُن ف مواظبت كردن.

**نگت:** ١) ئیزگەی ناوریگەی شەمەنەفەر؛ ٢) پولیسخانە ف ١) ایستگاه بین راه قطار؛ ٢) قرارگاه پلیس.

**نگرین:** توُرە‌بوُن ف عصبانی شدن.

**نگس:** ١) كەلەكە، خالیگە؛ ٢) ژان‌و برك، نەخوّشی كەلەكە ف ١) پهلو؛ ٢) درد پهلو.

**نگل:** لوُسكە ف امرد فاحشه.

**نگم:** ١) نقم، قوم، نقوم؛ ٢) **نخوُن** ف ١) به زیر آب رفته؛ ٢) نگون.

**نگمەسار:** نخوُنەوەبوُگ ف نگونسار.

**نگوُر:** لەو گوندانەی كوردستانە كە بەعسی كاولیان كرد ف روستایی در كردستان كه بعثیان آن را ویران كردند.

**نگە:** ئارەزو، تاسە ف اشتیاق.

**نگـین:** ١) بەخـت، تالـح: (**نگینی** هاوردوە)؛ ٢) نقیّم، قاش ف ١) شانس؛ ٢) نگین.

**نم:** ١) تەرّایی، شە، شیّ؛ ٢) كورت، كوّتا؛ ٣) بریّتی لە ئیلاقەكردن ف ١) نم؛ ٢) كوتاه؛ ٣) كنایه از مقاربت.

**نمـا:** ١) میّژ، نقیّژ؛ ٢) دیمەن؛ ٣) شاندەر: (قیبلە**نما**)؛ ٤) دیاری‌دا؛ ٥) خوُسا ف ١) نماز؛ ٢) منظره، نما؛ ٣) نشان دهنده؛ ٤) پدیدار شد؛ ٥) درآب نرم شد، خیس خورد.

**نماز:** نقیّژ، میّژ، نما ف نماز.

**نمازە:** ئاوازە، بەتایبەت ف بەویژە.

**نمـان:** ١) خوّشـانـدان؛ ٢) نەرم‌بوُنـەوە لەئاودا، خوُسان ف ١) خود را نمایاندن؛ ٢) نرم شدن در آب.

**نمانا:** كەمیّك لە زوّریّك بوّ ناسینی زوّرەكە ف نمونه.

**نماندن:** خوُساندن ف نرم كردن در آب، خیساندن.

**نمانە:** نمونە ف نمونه.

**نماو:** ١) خوُساو؛ ٢) نم‌و شەی بن تیّكوّلّی دارو گیا ف ١) نرم شده در آب، خیس خورده؛ ٢) نمی كه زیر پوستهٔ درخت و گیاه است.

**نماوی:** نمدار، شەدار، شیّدار ف نمین، نمدار.

**نمایش:** رانان، خوّرانان، رانانی كالاّو شت ف نمایش.

**نمایشت:** نمایش ف نمایش.

**نمایشگا:** جیّگەی رانان ف نمایشگاه.

**نم‌تك:** نز، زنە ف تراوش.

**نمدار:** نماوی ف نمدار، نمین.

**نمدان:** تەرّایی‌دان ف تراوش.

**نم‌دانەوە:** تەرّایی گەرّانەوە، لیّ‌چوُن: (ئەم گوّزە **نم‌ئەداتەوە**) ف نم دادن.

**نمدەر:** ١) شتیّ كە تەرّایی ئەداتەوە؛ ٢) مەندەر، دوّشەكوّلّە ف ١) تراوش كننده؛ ٢) تشكچه.

**نمرج:** روگرژوموّن ف اخمو.

**نمرە:** ١) پلە، دەرەجە؛ ٢) ژمارە بوّ ئەزموُنی دەرس‌خویّنان؛ ٣) حەمامی تەك‌نەفەرە ف ١) درجه؛ ٢) نمرهٔ درس؛ ٣) نمرهٔ حمّام، حمّام یكنفره.

**نمز:** نزم ف پست، كوتاه.

**نمس:** داعبایەكە بەقای پشیلە مشك‌و مار دەخوا ف جانوری است شبیه گربه موش و مار شكار می‌كند.

**نمسار:** نمدار، نماوی ف نمناك.

**نم‌نم:** ١) بارینی كەم‌كەم‌و لەسـەرخـوّ؛ ٢) موُروُی ورد، زەنگیانە ف ١) نم‌نم؛ ٢) مهرهٔ بسیار ریز زینتی، منجوق.

**نمنمـوّك:** ١) زەنگیانـە، منمنە؛ ٢) جوّریّ پەپوُلە، منمنوّك ف ١) مهرهٔ بسیار ریز، منجوق؛ ٢) نوعی پروانه.

**نموُج:** نمانا ف نمونه.

**نموُچ:** نموُج، نمانا ف نمونه.

**نموُد:** قەلاّفەت، دیمەن: (كاورایەكی بیّ**نموُدە**، باوكی زوّر بە**نموُد** بو) ف سیما، قیافه.

**نموُدە:** نموُج، نمانا، نموُچ ف نمونه.

**نمورئاو:** میزاو، ئاوی زوّر كەم ف باریكه‌ای از آب اندك.

**نموُس:** پەلّەپەلّەی روخسار ف كك‌مك.

**نموُنە:** نموُدە، نموُج، نمانا، نموُچ ف نمونه.

**نمە:** بارانی لەسەرخوّی وردیلە: (**نمەبارانیّك** باری) ف بارانِ نم‌نم.

**نمەبا:** بایێ كە تەرّایی هەیە ف باد مرطوب.

**نمەد:** تەحت، كولاو، لباد، لوا ف نمد.

نمەدزین: ئارەقگیری بن زین ف نمد زین.

**نمەدمالّ:** كەسیّ كە لباد دروست‌دەكا ف نمدمال.

**نمەز:** نازانم ف نمی‌دانم.

**نمـەك:** ١) مەك، خویّ، خوا؛ ٢) بریّتی لە خواردنی نانی كەسیّك؛ ٣) بریّتی لە دەلالی‌و دلّكیّشی؛ ٤) تەرّایی كەم ف ١) نمك؛ ٢) كنایه از نان و نمك؛ ٣) كنایه از جذّابیّت و دلربایی؛ ٤) نمِ اندك.

**نمەكاو:** ئاو وخویّ، خویّواوك ف آب نمك.

**نمەك‌بەحەرام:** سپلّە، بیّ‌ئەمەگ ف نمك‌نشناس.

**نمەكدار:** جوانی دلّكیّش ف زیبای نمكین.

**نمەكدان:** خویّدان ف نمكدان.

**نمەك‌كردن:** نانی كەسیّ خواردن ف نان و نمك كسی را خوردن.

**نمەك‌كویّر:** سپلّە، پیّ‌نەزان ف ناسپاس.

**نمەك گیر:** تۆشی بەلا هاتگ لە سزای بێئەمەگیو سپلەیی‌دا ف نمك گیر.

**نمەكناس:** بەئەمەگ ف حق شناس، باوفا.

**نمەكین:** نمەكدار ف زیبای نمكین.

**نمی:** نما، خوسا ف درآب نرم شد.

**نمێ:** نوێژ، نۆژ، نما ف نماز.

**نمیا:** نمی، نما، خوسا ف خیس خورده، در آب نرم شده.

**نمیای:** نماو، خوساو ف خیس خورده.

**نمێژ:** مێژ، نما، نماز، نفێژ ف نماز.

**نمین:** نمناك ف نمناك.

**نمیناندن:** كردنەبریكار ف وكالت دادن بەكسی.

**نمینگە:** مزگت، مزگەوت، مزگەت ف مسجد.

**نمینە:** نموونە، نمانا، نموج، نمودە ف نمونە.

**نمینەك:** سەرمەشق ف الگو، سرمشق.

**نمینەندە:** بریكاری خەلك، دەمراستی گەل ف نمایندە.

**ننگ:** لاق، پا، پاق، لنگ، نگ ف پا.

**ننە:** پێچەوانەی هەیە، نیە ف نیست، مقابل موجود است.

**نو:** ١) نان؛ ٢) پێچەوانەی ئا، نا: (تە دچی مالامە؟نو)؛ ٣) تازە؛ ٤) یان، ئان، یاخۆ ف ١) نان؛ ٢) نە؛ ٣) نو، تازە؛ ٤) یاخود.

**نۆ:** ١) نا، پێچەوانەی ئا؛ ٢) سێ جار سێ؛ ٣) دڕوشەڕانی: (سەگی **نۆ**)؛ ٤) زارۆی هاروهاج و بزۆز؛ ٥) تام‌تیژی؛ ٦) گیای تیژتام؛ ٧) ئەمە، ئەم‌شتە؛ ٨) تازە، نۆ، نوێ؛ ٩) نان ف ١) نە، خیر؛ ٢) عدد نُە؛ ٣) سگ درّندە؛ ٤) بچۀ بازیگوش؛ ٥) تندمزگی؛ ٦) گیاه تندمزّە؛ ٧) این؛ ٨) تازە، نو؛ ٩) نان.

**نوا:** ١) پێشەوە: (ئەڕا **نوا**)؛ ٢) ئەنوا، شوێنێ كە باران نەیگرێتەوە؛ ٣) ئەشكەوت، شكەفت، غار؛ ٤) هەرجار لە بەفر بارین: (ئەمشەو **نوایەك** بەفر باریوە) ف ١) پیش، جلو؛ ٢) پناهگاە از باران؛ ٣) غار؛ ٤) واحد شمارش دفعات بارش برف.

**نوار:** دامنەچەقان، بەركەڵ ف مادە گاو سەسالە.

**نوارْ:** روان، لەنوارین: (چاوە**نوار** بە) ف تماشا.

**نوارین:** تماشاكردن، روانین ف نگاە كردن.

**نواكێش:** سەرگەلە، رەمكێش، پێشەنگی گەلە ف نخراز گلە، پیشاهنگ.

**نوال:** شیوەڵەی پچوك لە قەدی چیا ف درۀ كوچك در كمر كوە.

**نواڵ:** نوال ف نگا: نوال.

**نواڵە:** ١) نواڵ؛ ٢) نزار لەكێودا، جێگەی تاونەگر لەچیادا؛ ٣) پڕی مشت لە درەوكراو؛ ٤) دەسكێ لە گەلاو گیا؛ ٥) بابۆڵەهەویر كە ئەدرێ بە حەیوان بەتایبەتی وشتر؛ ٦) نانی‌مفتێ، رزقی بێ‌ئەركدان ف ١) درۀ كوچك در كمر كوە؛ ٢) جای آفتاب نگیر در كوە؛ ٣) پُر مشت از درویدە؛ ٤) یك دستە از گیاە و برگ؛ ٥) نوالە؛ ٦) نان مفت و مجانی.

**نواڵە كردن:** پێچانەوەی بابۆڵەو هەرشتێ ف نوردیدن.

**نوان:** ١) چەمـاندیەوە. *دوای وشەی **دا** دێت* : (سەری **دانوان**)؛ ٢) نما، شاندەر: (ئاوێنەی **باڵانوان**) ف ١) خم كرد؛ ٢) نشان‌دهندە، نما.

**نواندن:** ١) شاندان، ڕانان؛ ٢) دەخەوكردن ف ١) نمایاندن؛ ٢) درخواب كردن، خوابانیدن.

**نوانن:** خەواندن ف خواب كردن.

**نوانی:** ١) ئەنوا، نوا، پەنا، پەسیو؛ ٢) خەواندی؛ ٣) بزوتن‌وحەرەكەت ف ١) پناهگاە؛ ٢) خوابانید؛ ٣) حركت.

**نواوێ:** لەو گوندانەی كوردستانە كە بەعسی كاولیان كرد ف روستایی در كردستان كە بعثیان آن را ویران كردند.

**نۆب:** باو، كاتێ كە لە دەم‌بەش كردن بۆ كارێ بەر كەسێ دە كەوێ: (ڤێجا **نۆبا** منە) ف نوبت.

**نوبار:** ١) كەوانی تازەسازو تەیار؛ ٢) تازەبەهار، سەرەبەهار ف ١) كمان تازەساختە و خوب؛ ٢) نو بهار.

**نۆبار:** ١) سەرەتای بەهار، نوبار؛ ٢) ناوی چەندئاواییەكە ف ١) نو بهار؛ ٢) نام چند آبادی.

**نۆبانێ:** نۆب كرن لشوڵەكێ‌دا ف نوبت گرفتن در كار.

**نۆبسڵمان:** عەیرەدینێ كە هاتۆتە سەر دینی ئیسلام ف نومسلمان.

**نۆبوك:** تازەوەوی، بوكی تازە، تازەبوك، بویكا نو ف تازەعروس.

**نۆبون:** دڕبون. بۆ سەگی ئێژن : (سەگی وە **نۆبویە**) ف درّندە شدن سگ.

**نۆبە:** ١) نۆب؛ ٢) كێشك، پاس ف ١) نوبت؛ ٢) كشیك.

**نۆبەبڕ:** كەسێ كە نۆبەی خاوەن‌نۆبەیەك داگیردەكا ف كسی كە نوبت را رعایت نمی كند.

**نۆبەبڕی:** گوێ‌نەدان بە نۆبەو داگیركردنی بەشەنۆبەی كەسانی‌تر ف نوبت رعایت نكردن.

**نۆبەبڕین:** نۆبەبڕی ف نوبت رعایت نكردن.

**نۆبەت:** ١) نۆبە، نۆب؛ ٢) كێشك، پاس؛ ٣) نۆبی تۆ ف ١) نوبت؛ ٢) نگهبانی، كشیك؛ ٣) نوبت تو.

**نۆبـەت گرتن:** ١) بۆ نۆبـە چاوەڕوان بون؛ ٢) ئێشـك گرتن ف ١) نوبت‌گیری؛ ٢) نگهبانی.

**نۆبەتی:** كاری بەنۆبە ف نوبتی.

**نۆبەتێ:** تا، تاو، تاو لەرز ف تب.

**نۆبەتێدار:** كەسێ كە تای لێ‌دێت ف تب‌دار.

**نۆبەچی:** ئیشكگر، كێشكچی ف نگهبان، پاسدار.

**نۆبـەخت:** ١) كیژێ كە خوازبێنی كرابێ؛ ٢) تازەكیسـە، كەسێ كە لەڕوتی‌یەوە دەوڵەمەند بوبێ ف ١) دختر خواستگاری شدە؛ ٢) نوكیسە.

**نۆبـەخش:** عافو لە تاوان بۆ ئێكەم‌جار: (بڕو ئەمە **نۆبەخشت** بێ ئێتر خراپە نەكەی) ف بخشش از گناە برای اوّلین بار.

**نۆبەدار:** كێشكچی، پاسدار ف نگهبان.

**نۆبەر:** میوەی تازەپێ‌گەیشتو ف نو بر میوە.

**نۆبـەرە:** ١) نۆبەر؛ ٢) ئێكەم‌فرزەند، نخری، نخوری ف ١) نوبر؛ ٢) نخستین فرزند.

**نۆبەرە كردن:** ئێكەم‌جار خواردنی میوەی گەیشتو ف خوردن میوۀ نوبر.

**نۆبەن:** جوانەگای سێ‌ساڵە کە تازە دەخرێتە بەرنیر ف گاو نر سەساله.

**نۆبەند:** نۆبەن ف گاو نر سەساله.

**نۆبەهار:** سەرەبەهار، هەوەڵی بوار ف اوّل بهار.

**نۆبیوُیك:** نۆبوُك ف نوعروس.

**نۆپاڵو:** جاشێ کە تازە باردەکرێ، دوُبڕ، کەرێ کەپێی ناوەتە سێ‌ساڵە ف کُرّه‌خر سەساله.

**نۆبیچکە:** منالی تازەپێ‌گرتو ف کودك تازەپا گرفته، نوپا.

**نوت:** ۱) زۆر تازە: (ئـەم جلکـە تازەو **نوت**‌و نوێ‌یە)؛ ۲) ڕشك، میتولە، میتولکە، بێچوی وردی ئەسپێ ف ۱) تازهٔ تازه؛ ۲) تخم شپش.

**نۆت:** حەفتاو بیست ف عدد نود.

**نۆتر:** ۱) دڕتر؛۲) پاسدار ف ۱) درّنده‌تر؛ ۲) پاسدار.

**نۆترڤان:** پاسدار ف پاسدار.

**نوتق:** ۱) قسـە، گوتـە: (کـابـرا لەتـرسـان هەر **نوتقی** نەما)؛ ۲) قسە بۆخەڵك‌کردن بە دەنگی بەرز: (حاکم هات **نوتقی** کرد) ف ۱) سخن؛ ۲) سخنرانی.

**نۆتك:** ۱) تویڵ، ئەنی، ناوچاوان؛ ۲) دەنکی ناو میوە؛ ۳)ڕشك، نوت ف ۱) پیشانی؛ ۲) هستهٔ میوه؛ ۳) تخم شپش.

**نۆتکە:** میتولکە، نوت ف تخم شپش.

**نۆتل:** وەکی، لەوێنەی، لەگوێن ف مانند، شبیه.

**نۆتلك:** ڕشك، نوت ف تخم شپش.

**نوتنە:** گەرا، تۆمی ماسی‌و جانەوەری زۆر پچوُك ف تخم ماهی و ملخ و حشرات.

**نۆتە:** پاشەکەوت، پەزمەندە ف پس‌انداز.

**نوُتەك:** تاریکایی خەست، تنۆك: (دنیا تاریك‌و **نوُتەك** بوُ چم‌نەدی) ف تاریکی شدید، ظلمات.

**نۆتەکردن:** پاشەکەوت‌کردن، پەزمەندەکردن ف پس‌اندازکردن.

**نۆتەکەر:** کەسێ کە پاشەکەوت دەکا ف پس‌اندازکننده.

**نۆتەم:** نەوەدەمین، دەنکێ دوای هەشتاونۆیەم ف نَوَدم.

**نوتەمین:** نۆتەم ف نَوَدُم.

**نۆتی:** نۆت، نەوەد ف نَوَد.

**نۆجوان:** تازەلاو ف نوجوان.

**نۆجـەژن:** ۱) سەرسـاڵی بیرەوەری‌مردو؛ ۲) هەوەڵ جەژن‌دوای مردنی خۆشەویستان ف ۱) سالروز مرگ، سالمرگ؛ ۲) اولین عید بعد از مرگ عزیزان، نوعید.

**نوچ:** ۱) چەم، چەمـانەوە؛ ۲) قەد، بەسەریەکاهێنانی کاغەزو پارچەو...؛ ۳) ڕەت، تل، ساتمە؛ ۴) سوُچی لێفەو کەواو...؛ ۵) نە، نەخێر ف ۱) خم، خمیدن؛ ۲) لایهٔ برهم آمده؛ ۳) تلو، سکندری؛ ۴) گوشهٔ لحاف و قباو...؛ ۵) نه، خیر.

**نوچـانـەوە:** ۱) چەمـانەوە؛ ۲) قەدکران، لابەسەریەکاهاتن ف ۱) خم شدن؛ ۲) تاشدن.

**نوچ‌بردن:** ڕەت‌بردن، ساتمەکردن ف تلوخوردن، سکندری خوردن.

**نوچ‌دان:** نوچ‌بردن ف تلوخوردن.

**نوچك:** ۱) باریکایی سەری شت، ترۆپك: (سەر **نوچکی** دارەکە، **نوچکی** چەقۆ) ۲) مست، مشت ف ۱) نوك بالای هرچیز؛ ۲) مُشت.

**نوچکە:** ڕەت، ساتمە، نوچ ف تلو.

**نوچکەبردن:** نوچ‌بردن ف تلوخوردن.

**نوچکەدان:** نوچ‌بردن ف تلوخوردن.

**نۆچە:** ۱) نۆجوان، تازەلاو؛ ۲) نۆبەرەی توتن ف ۱) نوجوان؛ ۲) توتون تازەرسیده.

**نوُچە:** دەنگ‌وباس، هەواڵ ف خبر.

**نوچەش:** نخری، نخوری، منالی نۆبەرە ف نخستین فرزند.

**نوچێ:** تازەدروست‌کراو، تازەداهاتو ف تازه‌ساز.

**نوچیان:** ۱) چەمانەوە؛ ۲) دانوشتان ف ۱) خم شدن؛ ۲) تاشدن.

**نوچیانـەوە:** ۱) نوچیان؛ ۲) ڕەت‌بردن‌و کەوتن ف ۱) نگا: نوچیان؛ ۲) دمر و افتادن.

**نوخ:** قەمبوُر، پشت‌کوُڕ، پشت‌چەماو ف کوژپشت.

**نوخاف:** عافو، بوردن، بەخشین لە تاوان ف عفو، بخشایش.

**نوخافتۆخ:** گوناەبەخش، خودێ ف بخشندهٔ گناه، خدا.

**نوخـافتـۆر:** خۆگوم‌کەر، ئەوی خۆی دەدزێتەوە لە فەرمانی میر ف زیر دررو، کسی که برای خودداری از اجرای دستور پنهان می‌شود.

**نوخافتی:** بەخشراو، عافوکراو ف مغفور، بخشوده.

**نوخان:** نخوُن‌بوُن، قلّپ‌بوُن ف نگون شدن.

**نوخانن:** نخوُن‌کردن ف سرنگون کردن.

**نوخاننەوە:** نوخانن ف سرنگون کردن.

**نوختا:** خاڵێ لە مەرەکەف کە دەخرێتە سەر قاقەز لە نوسینا ف نقطه.

**نوختك:** نوختا ف نقطه.

**نوختکن:** پیتی نوختەدار، بەنوختە ف حرف نقطه‌دار.

**نوختـە:** ۱) پەڵـەی زۆر چکـۆڵەی مەرەکەب لەسەر قاغەز؛ ۲) بنکەی پولیسی‌ڕێ ف ۱) نقطه؛ ۲) قرارگاه پُلیس راه.

**نوختەوخاڵ:** برێتی لە خۆجوان‌کردن بە داودەرمان، خاڵ‌و میل‌ڕشتن ف کنایه از بَزَك کردن.

**نوخسان:** ۱) سەقەت، نوقسان؛ ۲) بێ‌هێز؛ ۳) لاواز، لەڕ؛ ۴) کوێر، کوُر ف ۱) ناقص العضو؛ ۲) ناتوان؛ ۳) لاغر؛ ۴) کور، نابینا.

**نوخشانە:** ۱) پێش‌بینی چاکەو خراپە بۆ کەسێك؛ ۲) نۆبەرەی دەخڵ ف ۱) پیش‌بینی آینده برای دیگران؛ ۲) نوبر غلّه.

**نوخشە:** نوخشانە: (فلان‌کەس ژنی هێنا **نوخشەبێ** لە تۆش، مام‌پیرۆت قاچی شکا **نوخشەبێ** لە ژنەکەشی، **نوخشەی** گەنم هاتم) ف نگا: نوخشانه.

**نوخشەجار:** یەکەم‌جار، دەحفەی‌ئەوەڵ ف اوّلین بار.

**نوخۆ:** نخۆ، نخە. *دەگەڵ گوتەی شەر دێت* ف نخود.

**نوخوت:** نوخۆ ف نخود.

**نوُخن:** نخوُن، قلّپ ف نگون، سرنگون.

**نوخوری:** منالی نۆبەرە، نخری، نخوری ف نخستین فرزند.

**نوخۆشەر:** نخۆشەر، لەبە ف لَبّه.

**نوخوم:** بەرپیوار، داپۆشراو [ف] ناپدید، پوشیده.

**نوخومان:** داپۆشران [ف] زیر سرپوش قرارگرفتن.

**نوخوماندن:** داپۆشین، سەرپۆش لەسەردانان [ف] سرپوش گذاشتن.

**نوخومین:** نوخومان [ف] نگا: نوخومان.

**نوخوُن:** نخوُن [ف] نگون.

**نوخوُنبوُنەوە:** ۱) قلْپبوُنەوە؛ ۲) بریتی لە دارایی و سامان نەمان [ف] ۱) سرنگون شدن؛ ۲) کنایه از فقیرشدن بعد از ثروتمندی.

**نوخه:** نخه، نخۆ، نوخۆ، نوخوت [ف] نخود.

**نۆد:** نۆت، حەفتاو بیست [ف] عدد نود.

**نۆدشه:** شارۆکێکه لە کوردستان زانای زۆر گەورەی لێپەیدابوُن [ف] نام شهرکی در کردستان که علمای بزرگی از آن برخاستند.

**نودەرار:** نانپەیداکەر، بریتی لە گەورەی ماڵ [ف] نانآور خانه.

**نۆدەمین:** تاکێ دوای هشتاونۆیەمین [ف] نَوَدُم.

**نۆدەهەمین:** نۆدەمین [ف] نَوَدُم.

**نۆدێ:** ۱) تازەگوند؛ ۲) ناوی گوندێکه ژێگەی شێخمارفی نۆدێیی زانای بەناوبانگ [ف] ۱) تازەده؛ ۲) نام دهی در کردستان.

**نور:** گوندێکه لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد [ف] از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**نورْ:** ۱) بەراوەژو؛ ۲) والا، ناوخالْی، پوُك [ف] ۱) وارونه؛ ۲) تُهی، توخالی.

**نۆر:** نۆب، نۆبە، نۆبەت [ف] نوبت.

**نۆڕ:** نوارْ: (**بنۆرە، چاوەنۆرم**) [ف] نگاه.

**نوُر:** رۆشنایی خودا [ف] نور خدایی.

**نوراشتن:** دانوشتاندن، قەدکردن [ف] تاکردن.

**نوراشتی:** دانوشتاو، قەدکراو [ف] تاشده.

**نوردو:** نردو [ف] نگا: نردو.

**نۆردو:** نردو [ف] نگا: نردو.

**نۆردۆر:** دۆرمادار، دەوراندەور [ف] پیرامون.

**نوردی:** نردو [ف] نگا: نردو.

**نۆردی:** نردو [ف] نگا: نردو.

**نوُرسەگ:** نوسەکە، نوسەنەکە، نوسنەك، پرمێشك، پەنێرشْك [ف] خاری است که به لباس میپیچد.

**نۆرك:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد [ف] روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**نورمته:** باشو، واشه، باشوکه [ف] چرغ.

**نورونێوچاوانپاك:** بریتی لە پیاوی خوا [ف] کنایه از مرد خدایی.

**نۆره:** نۆبە، نۆب، نۆبەت [ف] نوبت.

**نۆڕە:** روانین بەچاوی زەقەوە [ف] نگاه خیره.

**نوُڕە:** ۱) زوڕە، گریان بەدەنگی زبر و ناخۆش؛ ۲) هاواری سەگ [ف] ۱) گریه با صدای زبر؛ ۲) ضجّهٔ سگ.

**نۆرەباب:** گوندێکه لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد [ف] از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**نۆڕەبـاب:** ۱) گونـدێکـه؛ ۲) نازنـاوی زانایەکی بەناوبانگ: (مەلای **نۆڕەباب**) [ف] ۱) نام دهی است؛ ۲) لقب دانشمندی مشهور.

**نۆرەبڕ:** نۆبەبڕ [ف] نگا: نۆبەبڕ.

**نۆرەبڕی:** نۆبەبڕی [ف] نوبت رعایت نکردن.

**نورەددین:** لەو گونـدانـەی کوردستـانـە کە بەعسی کاولیان کرد [ف] روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**نۆرەگرتن:** نۆبەگرتن [ف] ۱) بەنوبت ایستادن؛ ۲) کشیك دادن.

**نۆڕی:** ڕوانی، تواشای کرد [ف] نگاه کرد.

**نۆڕیزکێن:** زچێن، گەمەیەکە بە چەو ئەکرێ [ف] نوعی بازی با شن.

**نۆڕیزکێنه:** نۆڕیزکێن [ف] نوعی بازی با شن.

**نۆڕین:** روانین، تواشاکردن [ف] نگاه کردن.

**نۆز:** دیسان، دیسانەوە، سەرلەنوێ [ف] باز، ازنو.

**نوُز:** ۱) دەنـگـی باریکـی گریانـاوی؛ ۲) گرشـمـه، عیشـوە، دەگەڵ نازدەگوترێ: (نازو **نوُز**) [ف] ۱) صدای نازك همراه با گریه؛ ۲) ردیف ناز.

**نوُزا:** تازەزاو، کۆرپە، نۆ لەدایكبوُگ [ف] نوزاد.

**نوُزاك:** نوُزا [ف] نوزاد.

**نوُزاندن:** نوُزکردن، دەنگی گریاناوی دەربڕین [ف] گریه و لابەکردن.

**نوُزانەوە:** کرۆُزانەوە [ف] گریه و لابەکردن.

**نوزایش:** نوُزاندن [ف] گریه و لابه کردن.

**نۆزده:** حەڤدەو دو [ف] عدد نوزده.

**نۆزدەمین:** دو ژمارە دوای حەڤدەمین [ف] نوزدهم.

**نۆزدەهەك:** لەنۆزدەبەش بەشێك [ف] یك نوزدهم.

**نۆزدەهەم:** نۆزدەمین [ف] نوزدهم.

**نۆزدەهەمین:** نۆزدەمین [ف] نوزدهم.

**نۆزدەهی:** نۆزدەهەم [ف] نوزدهم.

**نوزدی:** نزیك، بەرانبەری دوُر [ف] نزدیك.

**نۆزکه:** نخری، نخوری، زارۆی نۆبەرە [ف] نخستین فرزند.

**نۆزگه:** نۆزکه [ف] نخستین فرزند.

**نوزڵه:** نزڵه [ف] سرماخوردگی شدید.

**نوُزنوُز:** قروسکەقروُسك [ف] نگا: قروسکەقروسك.

**نوُزه:** دەنگی گریانی لەسەرخۆ [ف] صدای مویه.

**نوُزەبڕین:** ۱) بێدەنگکردنی گریاو؛ ۲) بریتی لە خنکاندن و کوشتن [ف] ۱) خاموش کردن آدم گریان؛ ۲) کنایه از خفەکردن.

**نوُزەدرێژ:** چەنەبازی چەقەکەر [ف] رودەدراز.

**نوُزەنـوُز:** ۱) گریان بەسـەبـرۆکـه؛ ۲) فەرمان بە بەس کردن لە نوُزە: (تـوخـوا **نوُزەنـوُز**) [ف] ۱) گریه کردن به آهستگی، مویه، نیوه؛ ۲) فرمان به خاموش شدن از گریه.

**نۆزین:** جانوی تازەگیراو [ف] کره اسب تازەرام شده.

**نوُزین:** ۱) نۆزین؛ ۲) نوُزاندن [ف] ۱) کره اسب تازەزین شده؛ ۲) گریه و لابەکردن.

**نوژ:** سمین، کون کردن به مەتکەو [ف] سُفتن، سوراخ کردن.

**نۆژ:** ۱) گەنەی پەز؛ ۲) نوێژ، نما، نقێژ [ف] ۱) کنهٔ گوسفندان؛ ۲) نماز.

**نوژتی:** سماو، کونکراو ف سُنبیده، سوراخ شده.
**نۆژدار:** دەرمانی کاری بۆ چارەی دەرد ف نوشدارو.
**نۆژ کرن:** نوێژکردن ف نمازگزاردن.
**نوژوی:** نیسك، نژی، میژۆی ف عدس.
**نۆژەن:** ۱) نۆژ، دیسان، سەرلەنوێ؛ ۲) دارێژراوی کانزا ف ۱) ازنو؛ ۲) ریخته در قالب.
**نوُژەن:** تازەداهاتو ف نوظهور، نواختراع.
**نوژی:** میژۆی، نژی ف عدس.
**نوژیاو:** شۆرباونژی ف آش عدس.
**نوُژین:** کونکردن، سمین ف سوراخ کردن، سُنبیدن.
**نوُس:** ۱) لەپاش قسـەوە بەواتا: خەت‌لێ‌دراو: (چارەنوُس بۆ من وای هێنـاوە)؛ ۲) خەت‌لێدەر: (دەچمـەلای نوشتەنوُس) ف ۱) پسوند به معنی نوشته؛ ۲) پسوند به معنی نویسنده.
**نوُسا:** ۱) خەت‌درا، قاقەز بە قەڵەم خەت‌درا؛ ۲) لکا، چەسپا ف ۱) نوشته شد؛ ۲) چسبید.
**نوُسان:** ۱) قاقەز خەت‌دران، نڤیسان؛ ۲) لکان، چەسپان ف ۱) نوشتن؛ ۲) چسبیدن.
**نوُساندن:** ۱) نڤیساندن؛ ۲) لکاندن ف ۱) نوشتن؛ ۲) چسبانیدن.
**نوسانەوە:** لەبەرنوسینەوە ف رونویسی.
**نوُساو:** ۱) خەت‌دراو؛ ۲) لکاو ف ۱) نوشته؛ ۲) چسبیده.
**نوُسای:** ۱) خەتی لەقاقەزدا؛ ۲) لکای ف ۱) نوشت؛ ۲) چسبیدی.
**نوست:** نڤست، خەفت، خەوی‌لێ‌کەوت ف خوابید.
**نۆست:** دوعای نوسراو ف دُعای نوشته شده.
**نوستگ:** خەوتو، خەفتگ ف خوابیده، خفته.
**نوستن:** خەوتن، نڤستن ف خوابیدن.
**نوستوُ:** خەفتگ، نوستگ، نڤستی ف خوابیده.
**نوستەنە:** نوُسان، خەت لەقاقەزدان ف نوشتن.
**نوستی:** نوستو ف خوابیده.
**نوسخان:** سەقەت، نوقسان ف ناقص العضو.
**نوسراو:** خەت‌لێدراو ف نوشته.
**نوسراوە:** نوسراو ف نوشته.
**نوسرەت:** ۱) ناریکاری لەخواوە: (خوا نوسرەتی داین سەرکەوتین)؛ ۲) ناوی ژنانە ف ۱) کمك و مدد الهی؛ ۲) نام زنانه.
**نوسك:** پاڵ، دەڵەك ف هُل.
**نوسکاندن:** لکاندن، پێوەنوساندن ف چسبانیدن.
**نوسکانەوە:** ناڵینی زۆر بەسەبر: (ئەو مناڵە ئەنوسکێتەوە) ف نالهٔ ضعیف.
**نوسك دایش:** پاڵ‌پێوەنان، دەڵەك‌دان ف هُل دادن.
**نوسکە:** ناڵەی سەبرۆکە لە لاوازی و بێ‌تاقەتی ف نالهٔ ضعیف.
**نۆسکە:** نۆزگە ف نخستین فرزند.
**نوُسگە:** جێگای شت‌لێ‌نوُسین ف دفتر، جای نوشتن.
**نوُسندە:** نڤیسار ف نویسنده.
**نوُسەر:** نوُسندە ف نویسنده.
**نوُسەك:** ۱) شتێ کە توند دەلکێ: (دەموّکانە زۆر نوُسەکە)؛ ۲) رۆنیاس ف ۱) بسیار چسبنده؛ ۲) روناس.
**نوُسـەکـە:** تۆمی گیایەکـە دڕکـاوی بەخوریو جلکەوە دەلکێ ف تخم گیاهی است خاردار که بر پشم و لباس می‌چسبد.
**نوسەنگ:** نوسەکە، نوسنەك، پرمێشگ، پنرێشك ف نوعی خار.
**نوُسەنەکە:** نوُسەکە ف نگا: نوُسەکە.
**نوُسیار:** خەت‌خۆش ف خطّاط.
**نوُسیاگ:** ۱) نوسراو؛ ۲) چەسپاو ف ۱) نوشته؛ ۲) چسبیده.
**نوُسیان:** ۱) نڤیسین، خەت‌دان؛ ۲) لکان، نوُسان؛ ۳) خەتیان‌لێ‌دا ف ۱) نوشتن؛ ۲) چسبیدن؛ ۳) نوشتند.
**نوُسیاو:** نوُساو ف نگا: نوُساو.
**نوُسین:** نوُسیان ف نگا: نوُسیان.
**نوُسێن:** کەسێ کە شتێ بەشتێکەوە ئەلکێنێ ف چسباننده.
**نوُسینـەوە:** ۱) لەبـەر خەت گرتنـەوە؛ ۲) گوتـەی کەسێ خستنە سەر کاغـەز: (تۆ بێژە من ئەی‌نوُسمەوە) ف ۱) رونویسی، استنساخ؛ ۲) گفتار کسی را نوشتن.
**نۆش:** ۱) خواردنەوە، ڤەخارن؛ ۲) تراوی بەگیان‌خۆش ف ۱) نوشیدن؛ ۲) گوارا.
**نۆشاتر:** کانزایەکی سپی زۆر تیژی گەرمە مزگەران لە مس‌سپی کردنەوەدا دەکاری‌دەکەن ف نشادر.
**نۆشادر:** نۆشاتر ف نُشادر.
**نۆشان:** ڤەخارن، فڕکردن ف نوشیدن.
**نۆشاندن:** دەرخوارددانی تراو ف نوشانیدن.
**نۆشای:** نۆشان ف نوشیدن.
**نوشتا:** تۆمارکراو، نوسراو ف نوشته‌شدن.
**نوشتـار:** قەمچـان، زیچین، گەمەیەکە بەپەنج کوچك ئەکرێ ف بازی یەقُل دوقُل.
**نوشتاندنەوە:** ۱) داهێنان، چەماندن؛ ۲) قەدکردن ف ۱) خم کردن؛ ۲) تاکردن.
**نوشتانەوە:** ۱) داهاتنەوە، چەمانەوە؛ ۲) قەدبوُن ف ۱) خم شدن؛ ۲) تا شدن.
**نوشتاوە:** ۱) قەدکراو؛ ۲) چەماو ف ۱) تاشده؛ ۲) خمیده.
**نوشتاوی:** قەدکراوی ف تاشدگی.
**نۆشت‌بێ:** بەگیانت خۆش‌بێ ف نوش جانت.
**نوشتش:** نوُسین، نوسان، خەت لە قاقەزدان ف نوشتن.
**نوشتـو:** نڤـرشت، نڤشتی، نڤشتـۆك، نڤشت، دوعای‌نوسراو، نشتو ف تعویذ، دعای نوشته.
**نۆشتۆخ:** نوسەری زۆر بەکار، نڤیسیار ف نویسنده.
**نوشتە:** نوشتو ف دعای نوشته شده.
**نۆشتە:** ۱) نوشتە؛ ۲) نوسراو ف ۱) دُعای نوشته شده؛ ۲) نوشته شده.
**نوشتی:** نوشتو ف دعای نوشته.

**نوشخۆر:** پاشاخوڕ، نشخوٚر[ف] تەماندۀ آخور.

**نۆشدارو:** دەرمانی تراو[ف] داروی مایع.

**نۆش کردن:** فڕکردن، قەخارن[ف] نوشیدن.

**نوشگل:** چلێس، زۆر چێ لەخواردن[ف] شکم‌پرست، چلاس.

**نۆشنای:** نۆشاندن[ف] نوشانیدن.

**نوشـوس:** ۱) شکانی قەدرو حورمەت؛ ۲) زیان لەژیاندا[ف] ۱) تنزّل، پایین آمدن ارج و احترام؛ ۲) بدبیاری.

**نوشـوست:** نوشـوس: (هەرکەس بکا بێگانەپەرستی ئاخری هەر دێنێ **نوشوستی**) «مەسەل»[ف] نگا: نوشوس.

**نوشـوستهێنـان:** ۱) زیان‌کردن لەژیانا؛ ۲) لەقەدرکەوتن[ف] ۱) تنزّل احترام؛ ۲) بدآوردن.

**نۆشی گیان‌بوُن:** لەگیان خۆش‌هاتنی خواردن‌و قەخارن[ف] نوش جان شدن.

**نۆشین:** نۆشان[ف] نوشیدن.

**نوغروٚ:** نغروٚ[ف] نگا: نغروٚ.

**نوغم:** نوقم لە ئاودا[ف] غرق شده.

**نۆغەران:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد[ف] روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**نۆف:** ۱) جۆرێ پالآی سوك؛ ۲) پینـــەی پالآ[ف] ۱) نوعی پای‌افـزار سبك؛ ۲) پینۀ پای‌افزار.

**نوفت:** کەپۆ، بێقل، لوُت، کەپ[ف] دماغ، بینی.

**نوفوس:** ژمارەی ئاپۆرە[ف] نفوس.

**نوُڤ:** نوێ، تازە[ف] نو، تازە.

**نوڤاندن:** ڕانان، شاندان بەخەڵك[ف] نمایاندن، بەنمایش گذاشتن.

**نوڤەدان:** روُداوی تازە[ف] تازەرویدادە.

**نۆڤەر:** ئەم‌لایە، ئەم‌تەرەفە[ف] این طرف.

**نوُق:** ۱) قوُڵ، نق؛ ۲) نقـوم؛ ۳) پێکـەوەنـانی توندی ئەندام: (چاوت بنـوُقێنـە)[ف] ۱) گود، ژرف؛ ۲) آب از سر گذشته، غرق؛ ۳) برهم نهادن و درهم فشردن اندام.

**نۆق:** ۱) خالّیگە، کەلەکە؛ ۲) قوم‌بوُن لە ئاودا؛ ۳) کەمبەر، کەمەر[ف] ۱) پهلو؛ ۲) غرق شدن؛ ۳) کمر.

**نۆقار:** ۱) هەر گیانداری کە لەبن ئاودا دەژوا؛ ۲) ژێردەریایی[ف] ۱) هر جانوری که زیرآب راه برود؛ ۲) زیردریایی.

**نوُقان:** ۱) نقوم‌بوُن؛ ۲) قوُچان، چوُقان[ف] ۱) غرق شدن؛ ۲) بسته‌شدن اعضاء مانند چشم.

**نۆقاندن:** دەبن‌ئاوڕاکردن، خستنەژێرئاوەوە[ف] غوطەورکردن.

**نوُقاندن:** قوُچاندن، چوُقاندن[ف] برهم نهادن و درهم فشردن اعضاء.

**نوُقاو:** ۱) نقوم‌بوُگ؛ ۲) قوُچاو، چوُقاو[ف] ۱) غرقە در آب؛ ۲) عضو بستە.

**نوقتکاپەیەن:** ئاویلکەدان، گیانەلآو، دواهەناسە[ف] نفسهای آخر.

**نوقرا:** زیو، زیو[ف] نقرە.

**نوقرچك:** ۱) قورنج، لێ‌ڕەبادان؛ ۲) نقورچ، نقورچك[ف] ۱) نیشگون؛ ۲) سقلمە.

**نوقرسك:** تەکان‌خواردنی سەر لەبەر خەوهاتن، چوٚرت، خەونوچکە[ف] پینکی، چُرت.

**نوقرە:** زیوکفت، زیوتێ‌ساویاو[ف] سیم‌اندود.

**نۆق‌زراڤ:** بەژن‌باریك، قەباریك[ف] کمر باریك.

**نوقسان:** کەمایەسی[ف] نقص، کاستی.

**نوق‌ڤان:** مەلەوانی بن‌گۆم[ف] غوّاص.

**نوقـــڵ:** ۱) شیرنیات، شەکـروٚکـە، شەکـەرات؛ ۲) قولاّیی لە زاراوەی بەنایاندا[ف] ۱) آب نبات؛ ۲) از اصطلاحات بنّایان.

**نوقلاّنە:** ۱) نوخشانەی باش؛ ۲) شیرنی مژدەی خۆش[ف] ۱) پیش‌بینی خوب؛ ۲) شیرینی مژدە.

**نوقڵەکوردی:** بریتی لە برێشکەی گەنمەشامی[ف] چُس‌فیل.

**نوقم:** ۱) نقوم، ژێرئاوکەوتو؛ ۲) نخوُن[ف] ۱) غرقە در آب؛ ۲) نگون.

**نوقم‌بوُن:** ۱) ژێرئـاوکـەوتن؛ ۲) بریتی لە بێ‌سەروشـوێن چوُن[ف] ۱) زیرآب رفتن؛ ۲) کنایە از گم شدن.

**نوقم‌بوُنەوە:** نخوُن‌بوُنەوە، قلْپ‌بوُنەوە[ف] سرنگون شدن.

**نوقمەسار:** سەرنخوُن[ف] نگونسار.

**نوقورچ:** ۱) سیخورمە؛ ۲) قورنج[ف] ۱) سقلمە؛ ۲) نیشگون.

**نوقورچك:** نوقورچ[ف] نگا: نوقورچ.

**نوقورچکانە:** قورنج بۆ گاڵتە لە کەسێ کە جلکی تازەی دەبەرکردوە[ف] نیشگون شوخی‌آمیز.

**نوقورسك:** نوقرسك، چوٚرت، سەربزوتن لەبەر خەوالوُیی، خەونوُچکە[ف] چُرت، پینکی.

**نوقوستان:** سەقەت، نوقسان، نوخسان[ف] ناقص العضو.

**نوقول:** ۱) قول، کون؛ ۲) نوقڵ، شەکەرات[ف] ۱) سوراخ؛ ۲) نُقل.

**نوقوڵ:** نوقڵ[ف] نُقل، آب نبات.

**نوقولاندن:** کون کردن[ف] سوراخ کردن.

**نوقوم:** نوقم[ف] غرقە.

**نۆقە:** وشتری مێوینە، دەوەهێ نەنێر[ف] شتر مادە.

**نوُقین:** قوچان، چوُقان: (چاوت **بنوقێنە**)[ف] بستن، برهم نهادن.

**نۆك:** ۱) نخـە، نخـۆ، نوخـۆ، نوخـوت؛ ۲) نوُك، سەری باریك‌و تیژی هەرشتێ؛ ۳) پاشگری زاف‌شاندان[ف] ۱) نخود؛ ۲) نُك؛ ۳) پسوند مبالغە.

**نوُك:** ۱) سەری تیژو باریکی هەرشتێ: (**نـوُکەچەقۆ، نوُکەدەرزی**)؛ ۲) چاك. دەپێش *بەددا دێت* : (**نـوُك**و بەدی بۆ باس‌کرد)؛ ۳) نخە، نخۆ، نوخـوت؛ ۴) دەنگ بۆ سەرەتای گریان: (ئەم **نوُکەنوُکەی** لەچیە؟، بەس **بنـوُکێنـە**)؛ ۵) ئاسنۆکەی خواری ناوەڕاستی سەرەتەشی؛ ۶) دنـدوُکی مەل[ف] ۱) نُك؛ ۲) نیك؛ ۳) نخود؛ ۴) صدای کوتاه از گلو برای شروع گریە؛ ۵) میخ نیم حلقۀ سردوك؛ ۶) منقار پرندە.

**نۆکا:** ۱) ئیسە، نوُکە، هەنوُکە؛ ۲) ئەوسا، ئەوجارە[ف] ۱) اکنون؛ ۲) آنوقت.

**نۆکان:** گوندێکە[ف] نام دهی است.

**نۆکان:** دەنگی بڕەبڕە لەگەروەهاتن بۆ سەرەتای گریان ف صدای بریده از گلو برآمدن برای شروع گریه.

**نۆکاندن:** نۆکان ف نگا: نۆکان.

**نۆکاو:** شۆرباونۆك ف آش نخود.

**نوکتە:** حەنەك، قسەی پێکەنین ف جوك، لطیفه.

**نوکتەباز:** حەنەکچی، قسەخۆش ف لوده.

**نوکر:** کەندەکاری لە بەردو دار ف کندەکاری برسنگ و چوب.

**نوکراندن:** ١) کەندن لە دارو بەرد؛ ٢) بیرازکردن: (بەرێ ئیشێ مە نوکراند) ف ١) کندەکاری کردن بر چوب و سنگ؛ ٢) زبر کردن سنگ آسیاب ساییده.

**نوکروسك:** وێزنگی زل ف خمیازهٔ بزرگ.

**نوکل:** نکل، دندۆك ف منقار.

**نۆکڵ:** دەفری سواڵەتی تازە لەکڵ دەرهاتگ ف سفال نو از کوره درآمده.

**نوکم:** نکاو، گزوگومەت، لەپڕ ف یکهو، ناگهانی.

**نۆکن:** کەسێ کە زۆر نۆکەنۆك دەکا ف کسی که زیاد نك و ناله می کند.

**نوکوچ:** خل، خلی، خڕ، بۆچك بەقاڵب ف کوچکتر از قالب.

**نوکوچ کردن:** خلەخل کردن، خڕەخڕکردن ف صدای لق دادن.

**نوکوچەك:** خلەخل کەر، خڕەخڕکەر ف لق زدن.

**نوکورتە:** ١) ئەسپابی لەدارکەندن؛ ٢) نقورچ، سیخورمە ف ١) ابزارکندەکاری بر چوب؛ ٢) سقلمه.

**نوکوڵ:** ١) نکوڵ؛ ٢) دندۆك ف ١) پشیمان از قول؛ ٢) منقار.

**نوکوڵی:** نکوڵی ف پشیمانی از قول.

**نوکە:** نها، نهۆ، ئیسە، ئیستا، لەجێ، **هەنۆکە**، هەوکە، ئاییسە ف اکنون.

**نۆکە:** ١) نکەنك، نۆك؛ ٢) ئیستێ، لەجێ: (**نۆکە** لقر بو) ف ١) نك و ناله؛ ٢) اکنون.

**نۆکەبڕین:** بێدەنگ کردن ف بی صدا کردن.

**نۆکەتەشی:** تێلی سەرچەمێنراوی ناو سەرەتەشی ف میخ نیم حلقهٔ سردوك.

**نۆکەحوڵە:** نۆکی درشت ف نخود درشت.

**نۆکەر:** خزمەتکار، خوڵام ف نوکر.

**نۆکەر:** نۆکەر ف نوکر.

**نۆکەراتی:** خوڵامی، خزمەتکاری ف نوکری.

**نۆکەرایەتی:** نۆکەراتی ف نوکری.

**نۆکەڕەشکە:** جۆرێ نۆك کە ڕەنگی ڕەشە ف نخود سیاه.

**نۆکەری:** نۆکەراتی ف نوکری.

**نۆکەزۆردە:** فەریکەنۆك ف نخود دلمل.

**نۆکەسپی:** جۆرێ نۆك کە دەکرێتە لەبلەبی ف نوعی نخودکه نخودچی شود.

**نۆکەسپیکە:** نۆکەسپی ف نگا: نۆکەسپی.

**نۆکەسپیلکە:** نۆکەسپی ف نگا: نۆکەسپی.

**نۆکەشوانە:** نۆکەکێویلە کە ڕەنگی ڕەشە ف نوعی نخود وحشی سیاه‌رنگ.

**نۆکەڵ:** نۆبەند ف گاو نرسه‌ساله.

**نۆکەن:** شەقەجۆگەی زل بۆ تێکەڵاوکردنەوەی ئاوی دو سەرچاوەی لێك‌دوور ف کانال.

**نۆکەند:** نۆکەن ف نگا: نۆکەن.

**نۆکەنۆك:** نۆکە، گریانی بەناڵاندنەوە: (وەك چاوی وشکەسۆفی‌یە کانی لە دارو بەرد/ دەردێن بەسەد تەڕەنئوم و گریان و **نۆکەنۆك**) «نالی» ف گریهٔ توأم با ناله، گریه و زاری.

**نۆکەنیا:** سەرنیا، دەمەزەرد ف ترمیم نوك گاوآهن.

**نۆکیسە:** تازەپێداکەوتو، نۆبەخت، تازەکیسە ف نوکیسه، تازه به دوران رسیده.

**نۆکێ کەسك:** یۆڵکە، گاگۆز ف نخود فرنگی.

**نۆگن:** بەرکەڵ، چێڵی سێ‌ساڵە ف ماده‌گاو سه‌ساله.

**نوگوم:** نگوم ف ١) نگون؛ ٢) غرقه.

**نۆگە:** ١) نۆب، نۆبە، نۆرە؛ ٢) تای ڕۆژنارۆژە؛ ٣) گەمەو دەس‌بازی ف ١) نوبت؛ ٢) تب نوبه؛ ٣) شوخی و دست بازی.

**نۆگها:** تازەجوان، تازەلاو، جحێڵ ف نوجوان.

**نۆگەبڕکێ:** نۆبەبڕی ف رعایت نکردن نوبت.

**نۆگەچی:** نۆبەدار، ئێشك‌گر ف پاسدار، نگهبان.

**نۆگەن:** نۆبەند، گای سێ‌ساڵە ف گاوسه‌ساله.

**نۆگین:** چێڵی سێ‌بەهارە، مانگای سێ‌ساڵە ف ماده‌گاو سه‌ساله.

**نول:** ئاکار، ئەخلاق ف رفتار، خلق و خوی.

**نۆڵ:** نول ف رفتار، مشی.

**نۆڵ:** لوس و ساف. دەگەڵ *نەرم* دەگوترێ: (ژوشك بە بێچوی خۆی دەڵێ ئۆخەی ڕۆڵە نەرم و **نۆڵە**کەم) ف نرم، مقابل زبر.

**نۆلا:** چەشنی، وەکی، چون، وەکو ف مانند، مثل.

**نۆلانی:** چون‌یەکی، لێك‌چوون ف شباهت.

**نولچکە:** گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**نۆلکێ:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**نۆلەم:** نخری، نخوری، نۆزگە، نۆسکە، نۆبەرە ف نخستین فرزند.

**نۆم:** ناو، نام، ناف ف نام، اسم.

**نوما:** نما: (قیبلەنوما) ف نمایانگر.

**نۆما:** جوانوئەسپی دوساڵە ف کرّه اسب دوساله.

**نۆماڵ:** ١) کەسێ تازە ژن و ماڵی پێکەوەناوە؛ ٢) کەسێ تازە ماڵی هاتۆتە ئاوایی ف ١) تازه متأهّل شده؛ ٢) تازه در آبادی ساکن شده.

**نومتش:** وەشاردن، شاردنەوە ف پنهان کردن.

**نۆمدار:** ناودار، بەناوبانگ ف نامدار، مشهور.

**نۆمسڵمان:** نۆبسڵمان ف نومسلمان.

**نۆموسوڵمان:** نۆمسڵمان ف نومسلمان.

**نۆمە:** ناو، نێو، ناف ف اسم.

**نۆمەتش:** لارکردنەوە، خوارکردنەوە ف کج کردن.

**نۆمینە:** ۱) رۆژی عارەفە، رۆژێ بەر لە جێژنی قوربان؛ ۲) مانگی قوربان ف ۱) نهم ذیحجّه، روز عَرَفه؛ ۲) ماه ذیحجّه.

**نۆن:** ۱) نخۆن؛ ۲) نان؛ ۳) کەمایەسی و عەیب: (نۆن لە چاوی من دا یێ لەودا نیە)؛ ۴) ناوی پیتێ لە ئەلفوبێتکەدا؛ ۵) هۆرترین شت ف ۱) نگون؛ ۲) نان؛ ۳) کاستی و نقص؛ ۴) نام حرف «ن» در الفبا؛ ۵) ذرّه.

**نۆن‌پەتی:** نان‌خاڵی، نانی بەتەرسی ف نان تهی.

**نونجك:** مست، مشت، پەنجەی قوچاو ف مُشت.

**نۆنجگ:** نونجك ف مُشت.

**نونگ:** شوێن، شوێ ف اثر، رد.

**نونگە:** سوراغ، سۆسە ف سرنخ از خبر.

**نۆنگە:** دڵخۆش ف سرحال، دلخوش.

**نونو:** تازەتازە، زۆرتازە، بۆ جلکی دەڵێن ف بسیار تازه.

**نۆنۆ:** دانو، دانەوێڵەی کوڵاو بە زمانی منداڵانە ف حبوب آب‌پز در زبان کودکانه.

**نۆنۆڵە:** زەلامێ کە ئاکاری منداڵانە دەکا ف بزرگی که ادای بچه‌ها را درمی‌آورد.

**نۆنە:** نۆنۆ، دانۆڵە، دانۆ ف نگا: نۆنۆ.

**نۆنەر:** بریکار، وەکیل ف وکیل.

**نۆنەڵ:** بنیادەمی گردەڵی وریا ف قدکوتاه زرنگ.

**نۆنەمام:** خەڵفی تازەی یەکساڵە ف نونهال.

**نۆو:** نۆ، هەشت‌ویەك ف عدد نُه.

**نووازە:** کاری پیغەمبەران کە لەدەس کەسی‌تر نایە ف مُعجزه.

**نۆوە:** نۆرە، نۆبە ف نوبت.

**نۆوەن:** نۆبەند، نۆکەڵ ف گاو نر سه‌ساله.

**نۆوەند:** نۆبەند ف گاو نر سه‌ساله.

**نوهـ:** ۱) نو، تازە؛ ۲) نۆکە، ئێستێ، ئێستەکێ ف ۱) نو؛ ۲) اکنون، حالا.

**نوها:** نۆکە، نوهـ ف اکنون.

**نوهال:** دۆڵ، شیو، دەرە ف درّه.

**نوهانی:** تازەکار، ڕانەهاتوو هێشتا لەکار ف ناشی.

**نوهت:** ۱) خەفتـان، دەغڵی درەنگ‌چێنراو؛ ۲) کونی‌کرد، سمی ف ۱) بذر دیرکاشته شده؛ ۲) سوراخ کرد.

**نوهتن:** سمین، کون‌کردن بە مەتکەویا درێشە ف سوراخ کردن، سُنبیدن.

**نوهتی:** سماو، کون‌کراو ف سوراخ شده.

**نوهژەن:** نوژەن ف نگا: نۆژەن.

**نۆهك:** نۆك، نخە، نخۆ ف نخود.

**نۆهگوان:** دامنەچەقان، بەرکەڵ ف ماده‌گاو سه‌ساله.

**نۆهگۆن:** بەرکەڵ، مانگای سێ‌ساڵە ف ماده‌گاو سه‌ساله.

**نوهلیك:** دۆشەگ ف تشك.

**نوەن:** نۆبەند، جوانەگای تازەبەرجووت ف گاونر سه‌ساله.

**نوهۆ:** ۱) نۆهك، نخە، نۆك؛ ۲) نوها، نۆکە، ئێستا ف ۱) نخود؛ ۲) اکنون.

**نوهـوم:** ۱) قات لە خانـو، تەبـەقە؛ ۲) زگدانی دیوار: (دیوار نوهۆمی هێنـاوە) ف ۱) اشکـوبه، طبقهٔ سـاختمان؛ ۲) برامدگی دیوار، شکم دادن دیوار.

**نوهۆنە:** ۱) خانوی نوێ، خانوی تازە؛ ۲) نۆماڵ ف ۱) خانهٔ نو؛ ۲) نگا: نۆماڵ.

**نۆهەت:** نۆت، نۆد ف عدد نَود.

**نۆهەم:** دوژمارە دوای حەوتەم ف نُهم.

**نۆهەمین:** دوان پاش حەوتەمین ف نهمین.

**نۆهەوار:** ۱) تازەئێلاخ، شوێنی نۆ لەزۆزان؛ ۲) ماڵی تازە هاتبێتە زۆزانان ف ۱) ییلاق نوین؛ ۲) تازه به ییلاق آمده.

**نوەن:** نۆبەند، گای تەمەن سێ‌ساڵە ف گاوسه‌ساله.

**نوەی:** نۆك، نخە، نخۆ، نۆهك ف نخود.

**نوهی:** تازەیی، نوێیەتی ف تازگی.

**نوهێف:** مانگی لەنوێ، مانگی یەکشەوە ف هلال.

**نوهێل:** نوهال، شیو، گەلی، دەرە، دۆل ف دره.

**نوهێلکە:** مریشکێ تازە دەستی بەهێلکەکردن کردبێ ف مرغ تازه تخمگذار.

**نوهین:** تازە، نەفتونەو ف نوین.

**نوێ:** پێچەوانەی بلند، نزم، نمز ف پست، کم ارتفاع.

**نوێ:** نۆ، تازە ف نو.

**نوێ:** نوێ، تازە، نۆ ف نو.

**نوێرد:** تەقەڵ، باقیە ف بخیه.

**نوێردە:** قەراغ دادرونی لێوی لیباس ف کنارهٔ جامه را تاکردن و دوختن.

**نوێژ:** نما، نمان، نمێژ، مێژ ف نماز.

**نوێژان:** بەر لەخۆرکەوتن ف قبل از طلوع آفتاب.

**نوێژبوون:** کاتی نمێژ گەیشتن: (بڕوانە بزانە نوێژبوە؟) ف وقت نمازآمدن.

**نوێژبەقەڵاگێڕانەوە:** نوێژقەڵاکردن ف نگا: نوێژقەڵاکردن.

**نوێژچواندن:** نوێژ دەوەختی خۆی‌دا بەجێ‌نەهێنان ف نماز را به موقع نخواندن.

**نوێژچوون:** دەمی نمێژ فەوتان ف وقت نماز گذشتن.

**نوێژخوێن:** نوێژکەر، کەسێ کە نوێژ بەجێ‌دێنێ ف نمازگزار.

**نوێژخوێندن:** نمێژ بەجێ‌هێنان ف نمازگزاردن.

**نوێژدان:** مزگەوت: (پڕ وەم نوێژدانە ڕەحمەت بۆ باوات) ف مسجد.

**نوێژقایم:** کەسێ کە نوێژی ناچن ف نمازگزار دائمی.

**نوێژقـەڵاکردن:** نوێژی چوو کردنەوە، قەرەبوکردنەوەی نوێژی فەوتاو بە نوێژ ف نماز گذشته را قضا کردن.

**نوێژقەڵاکردنەوە:** نوێژقەڵاکردن ف نمازگذشته را قضا کردن.

**نوێژکردن:** نمێژ بەجێ‌هێنان، نوێژخوێندن ف نمازگزاردن.

**نوێژکەر:** نمێژکەر، نوێژخوێن، کەسێ کە نوێژ بەجێ‌دێنێ ف نمازگزار.

**نوێژگە:** مەچیت، مزگەوت ف مسجد.

**نوێژگێڕانەوە:** نوێژقەڵاکردن ف نماز گذشته را قضاکردن.

**نوێژنەکەر:** پێچەوانەی نوێژکەر، کەسێ کە نوێژ بەجێ‌ناهێنێ ف نمازنگزار.

**نوێژورۆژوپاك:** بریتی لە مرۆی زۆر بەدین‌و موسوڵمانی چاك ف کنایه از

متدیّن.

**نویژەبارانە:** نمیژ بۆ باران بارین لە ئیشکەساڵدا [ف] نمازباران.

**نویژەبارانی:** نویژەبارانە [ف] نماز باران.

**نویژی:** پاك و خاوێن: (جلکەکانم **نویژین**، ئەم بەڕەیە **نویژیە**) [ف] هرچیز پاکیزە و شایان نماز با آن گزاردن.

**نویژیان:** بەر لەتاوکەوتن، نویژان [ف] قبل از طلوع آفتاب.

**نۆیس:** نۆس [ف] نگا: نۆس.

**نۆیسان:** نۆسین [ف] نوشتن.

**نۆیسگە:** نۆسگە [ف] دفترخانە، جای نوشتن.

**نۆیسنە:** نۆسەر، نقیسار [ف] نویسندە.

**نۆیسین:** نۆیسان، نۆسین [ف] نوشتن.

**نۆیشك:** نقیشك، رۆنەکەرە [ف] کرە.

**نویشك:** شیلاوك [ف] پنیر مایۀ حیوانی.

**نویێ کردنـەوە:** ۱) کۆن تازەکـردنـەوە؛ ۲) لەسەرڕا دەست پێ کردنەوە: (شەڕەکەی **نوێ کردەوە**) [ف] ۱) کهنە را تازە کردن؛ ۲) ازسر گرفتن.

**نوێ کرن:** نوێ کردنەوە [ف] نگا: نوێ کردنەوە.

**نویگن:** دامنەچەقان، بەرکەڵ، نۆهگوان [ف] مادەگاوسەسالە.

**نویگوان:** نویگن [ف] مادە گاو سەسالە.

**نوێڵ:** باری، لۆسە، مەلغە [ف] اَهْرُم.

**نوێڵدان:** بەلۆسە بزواندن [ف] با اهرم حرکت دادن.

**نوێمانگ:** سەری مانگی تازە [ف] اوّل ماه.

نوین: نڤین [ف] رختخواب.

**نوێن:** ۱) نمـا: (ئـاوێنەی بالاّنوێن)، شاندەر؛ ۲) نڤین، کەل‌پەلی خەو، پێخـەف؛ ۳) تازە، نوێ: (نـوێنگـۆن)؛ ۴) بەرکـەڵ [ف] ۱) نمـا؛ ۲) رختخواب؛ ۳) نو؛ ۴) مادە گاو سەسالە.

**نۆین:** گۆنجە، گۆنگە [ف] تنبوشە.

**نوێنك:** ئاوێنە، گوزگی، قودیك، عەینك [ف] آیینە.

**نۆێنك:** ۱) نوێنك؛ ۲) نینگون [ف] ۱) آینە؛ ۲) مادە گاو سەسالە.

**نوێنگۆن:** نویگن [ف] مادە گاو سەسالە.

**نوێنگۆین:** نویگن، دامنەچەقان، نۆهگوان، بەرکەڵ، نویگوان [ف] مادە گاو سەسالە.

**نوێنگین:** نویگن، میگوان [ف] مادە گاو سەسالە.

**نوێ‌نمەك:** نیوەنمەك، هەویری ئامادە بۆ برین [ف] خمیر ویژۀ زخم و ضرب دیدگی.

**نوێنە:** بریکار، نایب [ف] نمایندە.

**نۆینە:** نوێنە [ف] نمایندە.

**نوێنەر:** ۱) بریکـار؛ ۲) شتێ کە پیـاو دەخەوکا [ف] ۱) نمایندە؛ ۲) خواب‌آور.

**نۆیەك:** لە نۆ پاژ پاژێك [ف] یك نهم.

**نۆیەم:** نۆهەم [ف] نهم.

**نۆیەمین:** نۆهەم [ف] نهم.

**نۆیی:** دڕی، شەڕفرۆشی [ف] ستیزەجویی.

**نۆیین:** دژایەتی، دژمنی [ف] دشمنی، ضدیّت.

**نهـ:** بلویر، نای، بلوێر، بلول [ف] نی لبك.

**نە:** ۱) لە، دە، وشەی دەفرایەتی‌یە: (**نەتۆی** دەرۆن‌دا)؛ ۲) پێچەوانەی ئا، نا؛ ۳) پیتی پرسیار: (**نـە** ولۆیە؟) [ف] ۱) در، علامت ظرفیّت؛ ۲) نه، مقابل آری؛ ۳) کلمۀ پرسشی.

**نەء:** نە، نا، ناو، نۆ، نۆ، پێچەوانەی ئا [ف] نه، کلمۀ رد.

**نەئا:** نەء [ف] نه.

**نەئا:** نەئا، نەء [ف] نه.

**نەئاژۆتی:** نەکێڵدراو [ف] شخم نزدە.

**نەئـــال:** ۱) شەڕانی، شەڕفــرۆش، تۆرەوتــۆسن؛ ۲) بەئـاژاوە [ف] ۱) ستیزەجو؛ ۲) مُفتن.

**نهـا:** ۱) نوها، نۆکە، ئیستە؛ ۲) نوا، پێشەوە؛ ۳) داینا، داینیا، دانی؛ ۴) نۆك، نخە [ف] ۱) اکنون؛ ۲) جلو، پیش؛ ۳) گذارد، گذاشت؛ ۴) نخود.

**نهار:** شیوەن، چەمەرە [ف] شیون.

**نهال:** نوهال، شیو، دەرە، دۆڵ [ف] وادی، درّە.

**نهالی:** پەلاس، بەڕەی سادەو کەم‌قیمەت [ف] گلیم ارزان قیمت.

**نهام:** ۱) نهۆم، قات؛ ۲) چین، تەبەق [ف] ۱) طبقە، اشکوبە؛ ۲) چین.

**نهاندن:** بریتی لە ئیلاقەکردن [ف] کنایە از مُجامعت.

**نهـانی:** ۱) نقـانی، کاری قورەکـاری، بەنـایی؛ ۲) جێگـەی سانەوەو ئیسراحەت [ف] ۱) گلکاری، بنّایی؛ ۲) جایگاه آسودن.

**نهایەت:** بڕانەوە، دوایی [ف] پایان.

**نەبا:** ۱) نەبوایە؛ ۲) نەوەکا [ف] ۱) نمی‌بود، اگر نبود؛ ۲) مبادا.

**نەبات:** جۆرەشەکرێکی مینایی‌ڕەنگە [ف] نبات.

**نەباتی:** بەڕەنگی نەبات [ف] بەرنگ نبات.

**نەبادا:** مەبادا [ف] مبادا، نکند.

**نەبـار:** ۱) نالـەبـار؛ ۲) ئیشکـەسـاڵ: (لەچاوا نم نەما بۆ گریە نۆرەی سەجدە بەردەریە/ سیاساڵم **نەبارە** نویژی ئیستیسقا نەکەم چبکەم؟) «مەحوی» [ف] ۱) نگا: نەبار؛ ۲) خشکسال.

**نەباش:** خراپ: (ئەڤ مرۆیەکە **نەباش**) [ف] بد.

**نەبالغ:** نابالغ، خۆنەناسیو [ف] بە سن رشد نرسیدە.

**نەبان:** ۱) شیردەرێ کە بێچوی خۆی ناوێ و شیری ناداتێ؛ ۲) بریتی لە کەسێ کە دەنگی لە یەکێ گۆڕیوە: (کاکم لیمان **نەبانە** نامان‌دوێنێ)؛ ۳) بەدمیجاز، هەمیشە قەڵس و تۆرە [ف] ۱) دامی کە از بچۀ خود تنفّر دارد؛ ۲) کنایە از بیگانگی کردن آشنا؛ ۳) بدخُلق، عصبانی.

**نەبانۆك:** خۆبویر لە کار، خۆ وەشێر لە ئەرك [ف] از زیرکار دررو.

**نەباو:** ۱) ناباب، پێچەوانەی دام‌وەستۆر؛ ۲) بریتی لە بەدفەڕ و بیژی [ف] ۱) ناباب؛ ۲) کنایە از بدطینت بی‌پدر.

**نەبـڕ:** ۱) کول: (ئـەم تەورە **نەبڕە**)؛ ۲) بنیادەمی کارلەدەست نەهاتوی بێ بڕشت [ف] ۱) کُند؛ ۲) آدم سُست کار.

نەبڕی: بەردەوام، بێ لەناوچۆن [ف] پایندە.

**نەبڕێ:** نابەجێ، ناڕەوا [ف] ناروا.

**نەبز:** تل‌دانی ڕەگ، لێدانی ڕەگ [ف] نبض.

**نەبـگ:** میوەی داری کنـار کە لەگوێژەزەردە دەکاو درشتترە [ف] میوهٔ درخت سدر.

**نەبناف:** بۆرەپیاگ، بێدەنگوناو [ف] گمنام.

**نەبـو:** ۱) هیچ نا: (خـوا ئێمـەی لە **نەبـو** دروست‌کرد)؛ ۲) رابوردوی نەبـوون: (چم پی **نەبو**)؛ ۳) نەگەیشتو: (ترێکەم هێشتا **نەبوە**) [ف] ۱) عدم، مقابل وجود؛ ۲) ماضی نبودن، نبود؛ ۳) میوهٔ نارسیده و کال.

**نەبوون:** ۱) هیچ نا، نەبو؛ ۲) فەقیری بێماڵی: (دەردی **نەبوون** ناخۆشە) [ف] ۱) نیستی؛ ۲) ناداری، فقر.

**نەبوونی:** فەقیری، دەستەنگی [ف] ناداری.

**نەبە:** ۱) حاشا؛ ۲) فەرمان بە نەبردن؛ ۳) پەند بۆ نەبوون: (زۆرد **نەبە**) [ف] ۱) انکار؛ ۲) مَبَر؛ ۳) مَباش.

**نەبەرد:** ئازا، رەشید، بەکار [ف] دلیر.

**نەبەز:** ۱) کۆڵنەدەر؛ ۲) شل‌وسست لە ڕاکردنا [ف] ۱) نستوه؛ ۲) ناتوان در دویدن.

**نەبەکام:** ۱) ناکام، کاو نارەوا؛ ۲) میوەی نیوەگەیشتوی هێشتا نیوەکاڵ [ف] ۱) ناکام؛ ۲) میوهٔ خوب نرسیده.

**نەبەکوو:** ۱) نەوەکو، نەکا؛ ۲) تاوانەبێ [ف] ۱) مبادا؛ ۲) این طور نباشد.

**نەبەگە:** شل‌وۆل، خۆنەگرتو [ف] سُست و نااستوار.

**نەبهیست:** کەڕ، نەبیس، گوێ‌کپ [ف] ناشنوا، کَر.

**نەبی:** ۱) نەبـو؛ ۲) پێغـەمبـەر؛ ۳) ناوە بۆ پیاوان [ف] ۱) نبود؛ ۲) نبی، پیامبر؛ ۳) نام مردانە.

**نەبێ:** ۱) بوونی لەبـەین‌بچێ؛ ۲) تمـەن، تۆمـەیژە؛ ۳) قسە مەکە [ف] ۱) نباشد؛ ۲) تونگو؛ ۳) حرف نزن.

**نەبیس:** ۱) گوێ‌نەگر، لاسار؛ ۲) کەڕ، گوێ‌نەبیس [ف] ۱) حرف نشنو، لجباز؛ ۲) ناشنوا، کَر.

**نەبیاوا:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد [ف] روستایی در کردستان کە بعثیان آن را ویران کردند.

**نەبیست:** نەبیس [ف] حرف نشنو.

**نەبین:** ۱) چاوپرووش؛ ۲) پیوار، نادیار، نەدیو [ف] ۱) کم‌بین، کم دید؛ ۲) غیب.

**نەبینا:** کوێر، کوێر، بێچاو [ف] نابینا.

**نەبینە:** بێدیتن: (وەرە با کەس **نەبینە** بکەین) [ف] بدون دیدن.

**نەپا:** لەفەوتان نزیك [ف] ناپایدار.

**نەپاتی:** نەکوڵاو، هەرکاڵ [ف] ناپختە.

**نەپاخ:** مۆشەدەمەی ئاسنگەر [ف] دم آهنگران.

**نەپاخچی:** کەسێ کە بەنەپاخ کاردەکا [ف] کسی کە با دم کار می کند.

**نەپاك:** ۱) چەپەڵ، گەمار، پیس؛ ۲) بریتی لە فێڵبازو دوڕوو [ف] ۱) کثیف؛ ۲) کنایە از مکّار.

**نەپایی:** بێ‌ئاگادار، بێ‌چاودێری‌کەر [ف] بدون محافظ.

**نەپخاندن:** ۱) فوودان، پف‌تێ‌کردن؛ ۲) بریتی لە تاریف‌کردن بەدرۆ [ف] ۱) پُف کردن؛ ۲) کنایە از مدح دروغین گفتن.

**نەپشت‌نەزك:** بێ‌بەروپشت، بریتی لە ناڕاست‌و دوڕوو [ف] کنایە از دورو و منافق.

**نەپوختە:** نەکوڵاو [ف] ناپختە، خام.

**نەپۆڕ:** نالەبار، نارێك [ف] ناهموار.

**نەپۆڕیان:** نارێکی‌و نالەباری [ف] ناهمواری و بە کار چیزی نیامدن.

**نەپەخەك:** فوودریاگ، پەنەماوبەبا [ف] بادکردە.

**نەپەرووشك:** ۱) چڕنوکی مەلی ڕاوکەر؛ ۲) نچیری مەلی ڕاوکەر [ف] ۱) چنگال پرندهٔ شکاری؛ ۲) نخجیر پرندهٔ شکاری.

**نەپەلولە:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد [ف] روستایی در کردستان کە بعثیان آن را ویران کردند.

**نەپەندن:** شاردنەوە، گومکردن لەبەرچاوان [ف] پنهان کردن.

**نەپەندی:** نادیار، نهێنی [ف] ناپیدا، غیب.

**نەپەنی:** نادیار، گوم لەبەرچاو [ف] ناپیدا.

**نەپیاو:** ۱) ناپیاو، نامـەرد؛ ۲) پیاوێ کە توانای گان‌کردنی نەبێ [ف] ۱) نامرد؛ ۲) مردی کە توان جنسی ندارد.

**نەپێژاندی:** نەکوڵاو، نەبرژاو [ف] کال، ناپُختە.

**نەپێکهاتی:** پێك‌نەهاتوو، ئامادەنەکراو، جێ‌بەجێ‌نەکراو [ف] مُهیّا نشدە.

**نەتـاشـراو:** ۱) داری تیخ‌لێ‌نەدراو؛ ۲) بریتـی لە بنیادەمی کەم‌فام‌و پەروەردەنەکراو [ف] ۱) ناتراشیدە؛ ۲) کنایە از آدم زمخت و کم فهم.

**نەتاشیاگ:** نەتاشراو [ف] نگا: نەتاشراو.

**نەتاشیاو:** نەتاشراو [ف] نگا: نەتاشراو.

**نەتانین:** نەتوانین، لەتاقەتدا نەبوون [ف] نتوانستن.

**نەتـر:** ۱) رەت، تەکـان، بزاو؛ ۲) مات‌و بێدەنگی [ف] ۱) تلو، تکـان؛ ۲) خاموشی و سکون.

**نەتراندن:** ۱) بزاوتن، رەت‌پێدان؛ ۲) بێدەنگ‌و جووڵەکردن [ف] ۱) تکان دادن؛ ۲) ساکت ماندن و حرکت نکردن.

**نەترس:** بوێر، ئازا، گەڕناس [ف] نترس.

**نەترك:** پرپرەو پەرەنگی زەنبەر بەچەشنی مانگیلە: (پەیوەستە ژوەسلێ تە دمـێنم کو سەراسـەر/ بشکـۆژو تەلیسم‌و وەرەق‌و **نەتـرك**‌و بازن) «جـزیری»، (کـوفی ژجـەواهێران موکـەللەل/ کۆتـەرگە ژ**نەترکان** موسەلسەل) «خانی» [ف] یکی از زیورآلات.

**نەترنایش:** لەژێر چاوەدێری گیراو [ف] تحت نظر.

**نەوش:** تەوەزەل، تەمەڵ [ف] تنبل.

**نەترە:** ۱) غیرەتی دڵ، قەوەتی دەروون؛ ۲) رەت، تل، تەکان [ف] ۱) جرأت؛ ۲) تکان.

**نەترەبردن:** ۱) زراوبردن، ترساندن؛ ۲) رەت‌بردن [ف] ۱) زهرەترك کردن؛ ۲) تلوخوردن.

**نەترەبۆق:** زەبەلاحی تەژە [ف] لندهور.

**نەترەدان:** رەت‌بردن [ف] تکان خوردن.

**نەتشت:** نەهیچ [ف] ناچیز.

**نەتك:** ۱) ڕێگەی سەنگ فەرش؛ ۲) ڕێگەی پیادە لە جادەو خیاباندا [ف] ۱) راە سنگ‌فرش؛ ۲) پیادەرو.

**نەتل:** دوژمن، نەیار، دژ [ف] دشمن.

**نەتڵ:** ١) ملۆزم؛ ٢) لەڕێگەدەرچوگ ف ١) سهمناك؛ ٢) منحرف.
**نەتم:** ١) کاتی، ئامانەتی، نەبەیەکجاری؛ ٢) کەمقسە ف ١) موقتی؛ ٢) کم سخن.
**نەتۆ:** بەدفەڕ، ئاکارخراپ ف بداخلاق.
**نەتۆرە:** ناتۆرە ف لقب زشت.
**نەتوڕە:** لەسەرخۆ، هێدی، هێمن ف آرام، شکیبا.
**نەتوتشت:** بێ کەڵك، هیچ‌وپوچ ف بی بهره.
**نەتوکەس:** نامەرد، ناکەس، خوێڕی، خوڕی ف نامرد.
**نەتوهاوە:** کاری نالەبار، کردەی ناحەز ف کار زشت.
**نەتـە:** ١) شوکراوی ئامادەی چاندن؛ ٢) خەلەی تازەشین‌بوگ ف ١) زمین شخم‌زدهٔ آمادهٔ کشت؛ ٢) غلّهٔ تازه‌روییده.
**نەتەکن:** بڤە، جێ‌مەترسی، هیلاك، فەلاکەت ف خطرناك.
**نەتەل:** دوژمن، دژ ف دشمن.
**نەتەڵە:** مرۆترسێن ف ترساننده.
**نەتەوایەتی:** گەلایەتی، قەومایەتی ف ملّیّت.
**نەتەوە:** ١) تۆرەمە، رەگەز؛ ٢) فرزەندی فرزەند ف ١) نژاد، نسل؛ ٢) نواده.
**نەتەوەپەرستی:** کارکردن بۆ قازانجی گەل ف ملّت‌خواهی.
**نەتەوی:** دوژمن، دژ ف دشمن، ضدّ.
**نەتەوێ:** ١) داوا مەکە؛ ٢) قبوڵ مەکە ف ١) نخواه؛ ٢) نپذیر.
**نەتیجە:** ١) ئاکام، حاسڵی شتێ؛ ٢) مناڵی نەوە ف ١) نتیجه؛ ٢) فرزند نوه، نبیره.
**نەتێدا:** بەدەر، ڕەگەڵ‌نە ف مردود، قبول نشده در گروه.
**نەتێر:** هەژار، برچی، دەس‌کورت ف بینوا، مُحتاج.
**نەتیژە:** مناڵی نەوە ف نبیره.
**نەتێو:** لەسەرنەکراو، نەلێ، وەرنەگیراو ف قبول نشده در گروه.
**نەجابەت:** ئاکاری باش‌و پیاوانە ف اخلاق پسندیده و مردانه.
**نەجات:** رزگار ف نجات.
**نەجـاتبوُن:** ١) رزگاربـوُن؛ ٢) تەواوبـوُنی کار؛ ٣) تەواوکردنی کار: (لـەدروێنەی **نەجاتم‌بو**) ف ١) رها شدن، آزاد شدن؛ ٢) پایان یافتن کار؛ ٣) فارغ شدن از انجام کار، به پایان رسانیدن.
**نەجـاتدان:** ١) رزگارکـردن؛ ٢) تەواوکردنی کار ف ١) نجات دادن، خلاص کردن؛ ٢) کار را تمام کردن.
**نەجاخ:** تەورۆکە، تەوری‌پچوك ف تبر کوچك.
**نەجاڕ:** دارتاش ف درودگر.
**نەجاو:** بێ هێنان‌و بردن لەناو دەم‌و ددانا ف ناجویده.
**نەجاویاگ:** نەجاو ف ناجویده.
**نەجاویاو:** نەجاو ف نجویده.
**نەجدی:** ئەسپی کلك قەیچی‌کراو ف اسب دم قیچی شده.
**نەجڤ:** بێ‌بزوتن ف بی حرکت.
**نەجم:** نەجڤ ف بی حرکت.
**نەجمە:** ١) ئەستێرەی سەرشانی ئەفسەر؛ ٢) ناوە بۆ پیاوان، سوکەڵەی نەجمەدین ف ١) ستارهٔ سردوش افسران؛ ٢) اسم مردانه.
**نەجوُراو:** نەجاو ف ناجویده.
**نەجـەلاندی:** ١) مشت‌وماڵ نەدراو؛ ٢) خوڕست، خۆکرد ف ١) صیقل ندیده؛ ٢) طبیعی.
**نەجیب:** ١) رەسـەن؛ ٢) ئاکـارباش ف ١) نجیب، اصیل؛ ٢) خوش اخلاق، نیکورفتار.
**نەجیبزادە:** رەسەن ف نجیب‌زاده.
**نەجیبزایە:** نەجیب‌زادە ف نجیب‌زاده.
**نەجیم:** نەجیب ف نجیب.
**نەجیمزادە:** نەجیب‌زادە ف نجیب‌زاده.
**نەجیمزایە:** نەجیب‌زادە ف نجیب‌زاده.
**نەجیو:** نەجیب ف نگا: نەجیب.
**نەچار:** ناچار ف ناچار.
**نەچڵیان:** راست‌نەهاتن، دروست دەرنەچوُن ف دُرُست درنیامدن.
**نەچی:** ١) وشـەی ئاگادارکـردن بۆ گێڕانەوە لە کارێ: (**نەچی** ئەوکارە بکەی)؛ ٢) لە ڕۆیشتن دەست‌بەردە ف ١) نکنی!؛ ٢) نروی.
**نەچێ:** ١) نەڕوا، نەچێت؛ ٢) خراپ‌ونالەبار ف ١) نرود؛ ٢) زشت و ناپسند.
**نەچیر:** نچیر ف نخجیر، شکار.
**نەچیرڤان:** نچیرڤان، راوکەر ف شکارچی.
**نەحس:** شوُم، بێ‌فەڕ ف شوم.
**نەحلەت:** لەعنەت ف نفرین، لعنت.
**نەحەلێ:** رامەکە، غارمەدە ف مدو.
**نەخ:** داوەبەنی خوری ف نخ پشمین.
**نەخازا:** ناوازە، خاسما، تایبەتی ف و بەویژه.
**نەخازە:** ١) ناوازە، بەتایبەت؛ ٢) نەتەوێ ف ١) بەویژه؛ ٢) نخواه.
**نەخاسم:** نەخازە، ناوازە ف بەویژه.
**نەخافڵ:** ناخافڵ ف ناخودآگاه.
**نەخالی:** نهالی، پەلاس، بەڕەی ساکار ف گلیم ساده، پلاس.
**نەخاندی:** بێ‌سیوات ف ناخوانده، بی‌سواد.
**نەخت:** ١) تۆزقـاڵ، کەم: (نـەختێ لەم مێوژەم دەرێ)؛ ٢) پێچەوانەی قەرز: (**بەنەخت** بەچەند؟)؛ ٣) زەوی بەرێژەو؛ ۴) قەلەن، شیربایی؛ ۵) پارەی‌لەسکـەدراو ف ١) انـدك؛ ٢) نقـد، مقـابـل نسیه؛ ٣) زمین پرحاصل؛ ۴) شیر بها؛ ۵) نقد، مسکوك، مقابل جنس.
**نەخت‌وپـوخت:** ١) بێ عەیب‌و کەمـایەسی؛ ٢) گش، سەرلـەبـەر: (قسـەکـەی **نەخت‌وپـوخت** لەبەردەم دانا) ف ١) بدون نقصان؛ ٢) همگی، عموماً.
**نەختـۆکـە:** کەموُکە، زۆر کەم: (ئەو **نەختۆکە** گەنمەم هەیە) ف کمك، بسیار اندك.
**نەختوُکە:** نەختۆکە ف بسیار اندك.
**نەختە:** سەرمای سەخت ف سرمای سخت.
**نەختەنەختە:** کەم‌کەمە ف اندك اندك.

**نەختێ:** کەمێ، کەموکەیێ [ف] اندکی.

**نەختێك:** کەمێك [ف] اندکی.

**نەختینە:** گەنجینە [ف] گنجینە.

**نەخری:** ١) نخری، نخوری، نۆبەرەی منالْ؛ ٢) خورێن؛ ٣) بالآتە، نۆبەرەی‌میوە [ف] ١) نخستین فرزند؛ ٢) ناشتا، صبحانە نخوردە؛ ٣) نوبرمیوە.

**نەخرین:** خورێن‌بوُن [ف] ناشتابودن، گرسنەماندن.

**نەخس:** شوم، نەحس [ف] شوم، نحس.

**نەخش:** ١) رەنگو شکڵی دروسکراو بە دەست؛ ٢) بەختو هات: (**نەخشی** هێناوە) [ف] ١) نقش و نگار؛ ٢) شانس.

**نەخشاندن:** بەڕەنگی جوان ڕەنگاندن [ف] نقش و نگارزدن.

**نەخشاندی:** ١) نەخش‌کراو، نەخشاو؛ ٢) ڕەنگاندی [ف] ١) مُنقّش؛ ٢) نقاشی کرد.

**نەخشاو:** بەڕەنگی جوان ڕەنگاو [ف] منقوش.

**نەخشبەند:** ١) کەسێ شت بە ڕەنگ‌پیاساوین جوان‌دەکا؛ ٢) نازناوی خاوەن‌تەریقەتێك کە ناوی محەممەد بەهائەددین‌و قەبری لە شاری بوخارایە [ف] ١) نقش‌گر؛ ٢) لقب یکی از سران سلسلهٔ طریقت.

**نەخشبەندی:** مریدانی تەریقەتی نەخشبەند [ف] پیرو طریقهٔ نقشبندی.

**نەخشدار:** بەنەخش‌کراو، دژی ساکار [ف] منقش.

**نەخشونیگار:** ١) وێنەو شکڵ پێکەوە؛ ٢) بریتی لە چۆنیەتی کاروباری ژیان [ف] ١) نقش و نگار؛ ٢) کنایە از وضع زندگی.

**نەخشە:** ١) شکڵی وڵاتو سەرزەمینان لەسەر کاغەز، خەریتە؛ ٢) بڕیاری چۆنیەتی کردنی کارێك لەبیروهۆش‌دا [ف] ١) نقشهٔ جغرافیایی؛ ٢) طرح، نقشهٔ انجام کاری.

**نەخشەبەندی:** نەخشبەندی [ف] نقشبندی.

**نەخشەکێشان:** پیلان‌گێڕان [ف] توطئەچینی.

**نەخشەکێشانەوە:** نوُسینی شکڵی شتێك یان وڵاتێك لەسەر کاغەز [ف] نقشەکشی.

**نەخشین:** ١) جوان‌و ڕەنگاوی؛ ٢) ناوە بۆ ژنان [ف] ١) دارای نقش و نگار، منقوش؛ ٢) نام زنانە.

**نەخشیو:** نەخشاو [ف] منقوش.

**نەخفی:** زگ‌باکردو، فوکراو [ف] بادکردە.

**نەخلەش:** پڕبەر، بەری زۆر هەیە [ف] پُربار.

**نەخلیایش:** نەخلەش [ف] پُربار.

**نەخو:** ئەدی، ئەی‌چی، کە وابێ [ف] پس، چە.

**نەخۆ:** ١) مەبادا؛ ٢) دەنا، ئەگینا؛ ٣) مەخۆ؛ ٤) هەرئاوەها [ف] ١) مبادا؛ ٢) وگرنە؛ ٣) مخور؛ ٤) بەهمین ترتیب.

**نەخوازا:** ناوازە، نمازە، بەتایبەتی، نەخازا [ف] و بویژە.

**نەخوازە:** نەخوازا [ف] و بەویژە.

**نەخوازەلا:** نەخوازا [ف] وبە ویژە.

**نەخوازی:** نەتەوێ، گەرەکت‌نەبێ [ف] نخواه.

**نەخوازیاگ:** بێ‌بەش لە داواکردن [ف] ناخواستە.

**نەخوازیاو:** نەخوازیاگ [ف] ناخواستە.

**نەخواستە:** لە مەبەست دوُربێ، لەپاش ناوی خودا دێت: (خودانە**خواستە** چت لێ‌قەوماوە) [ف] ناخواستە، با کلمهٔ خدا آید.

**نەخۆر:** ١) کەسێ لە خواردن دوُرە: (نان **نەخۆرە**، قەرز **نەخۆرە**)؛ ٢) بریتی لە ڕژدو لەچەر: (ماڵ **نەخۆر** هین بخۆرە) [ف] ١) کسی کە نمی‌خورد؛ ٢) کنایە از خسیس.

**نەخۆش:** ناخۆش، لەش‌بەبار [ف] نگا: ناخۆش.

**نەخۆش‌بوُن:** دوچاربوُن بە لەش‌بەباری [ف] بیمارشدن.

**نەخۆشخانە:** خەستەخانە [ف] بیمارستان.

**نەخۆش کەفتن:** نەخۆش‌بوُن [ف] بیمارشدن.

**نەخۆش کەوتن:** نەخۆش‌بوُن [ف] بیمارشدن.

**نەخۆشی:** لەش‌بەباری [ف] بیماری.

**نەخۆشین:** نەخۆشی [ف] بیماری.

**نەخون:** ئەسپێ کە لای قوُنی بڵندەو ملی نەوی‌یە [ف] اسبی کە کَفَل برجستە و گردن فروهشتە است.

**نەخۆندە:** نەخاندی [ف] بیسواد.

**نەخۆندی:** نەخاندی [ف] بیسواد.

**نەخۆنە:** نەخاندی [ف] بیسواد.

**نەخوێندو:** نەخاندی [ف] بیسواد.

**نەخوێندەوار:** نەخاندی [ف] بیسواد.

**نەخوێندەواری:** بێ‌سیواتی [ف] بیسوادی.

**نەخوێندی:** نەخاندی، نەخۆنە [ف] بیسواد.

**نەخەسەلا:** نەخوازەلا [ف] و بە ویژە.

**نەخەم:** قەیدی نیە، با وابێ [ف] باشد.

**نەخەمە:** نەخەم [ف] باشد.

**نەخێر:** نە، نەئا [ف] نە، چنین نیست.

**نەدار:** بێ‌ماڵ، دەستەنگ، بەلەنگاز، فەقیر [ف] فقیر.

**نەداری:** بێ‌ماڵی، دەستەنگی [ف] فقر.

**نەدامەت:** نەگبەت [ف] ١) مصیبت؛ ٢) سیەروزی.

**نەدان:** ١) تەسمیل‌نەکردن؛ ٢) بێ‌ئاوەز [ف] ١) ندادن؛ ٢) نادان.

**نەدر:** نزر [ف] نذر.

**نەدو:** کەم‌قسە [ف] کم حرف.

**نەدوُر:** نزیك [ف] نزدیك.

**نەدویر:** نەدوُر [ف] نزدیك.

**نەدوێن:** نەدو [ف] کم حرف.

**نەدیار:** نەخویا،بەرپیوار،نەئاشکرا، نادیار [ف] ناپیدا.

**نەدیاری:** نەدیاربوُن، گوم‌بوُن [ف] ناپیدایی.

**نەدی‌بدی:** تازەپێداکەوتوی زۆر ماڵ‌خۆشەویست [ف] ندیدبدید.

**نەدیتبار:** نەبانۆك، خۆبوێر، خۆوەشێر لە ئەرك [ف] اهمال کنندە.

**نەدیتە:** ١) نەبینە، کڕین‌و فرۆشتنی بێ‌دیتن: (**نەدیتە بەچەند؟**)؛ ٢) نەتەوەی نەتەوە [ف] ١) ندید، معاملە بدون دیدن؛ ٢) فرزند نبیرە.

**نەدیدە:** نەدیتە [ف] نگا: نەدیتە.

**نەدیر:** ۱) ئاگری سەرچیا بۆ خەبەر بەخەڵکدان؛ ۲) زوو، بەمزوانە ف ۱) آتش اعلام خبر بر فراز کوهها؛ ۲) بەزودی.

**نەدیگ:** نەبینراو ف ندیده، ناآشنا.

**نەدیو:** گوم لەبەرچاو ف پنهان از دید.

**نەدی‌وبدی:** نەدی‌بدی ف ندیدبدید.

**نەر:** ۱) نك، جەم؛ ۲) سوچ، قوژبن ف ۱) نزد؛ ۲) گوشه، نبش.

**نەڕ:** ۱) پێچەوانەی مێوینە؛ ۲) جۆرێکە لە ڕەسەنی وشتر: (ئەم وشترە نەڕە) ف ۱) نر؛ ۲) نوعی نژاد شتر.

**نەڕاست:** ۱) خوار، چەوت، گێڕ؛ ۲) درۆ؛ ۳) بریتی لەدرۆزن ف ۱) کج؛ ۲) دروغ؛ ۳) کنایه از دروغگو.

**نەڕاستەڕێ:** نە بە ئاشکراو ڕوبەڕو ف غیرمستقیم.

**نەڕاستی:** ۱) بەدەل؛ ۲) خەیانەت؛ ۳) بەگاڵتە، بەشۆخیەو ف ۱) بَدَل؛ ۲) خیانت؛ ۳) بەشوخی.

**نەڕان:** ۱) گوڕە، دەنگی‌زلی‌بەقەوەت؛ ۲) ناوی گوندێکە لە کوردستان ف ۱) غرّش؛ ۲) نام دهی است.

**نەڕاندن:** گوڕاندن ف غریدن.

**نەرانن:** نەڕاندن ف غریدن.

**نەربەند:** مڕمەند ف سوهان.

**نەرپێچ:** مارپێچ قلیان ف مارپیچ قلیان.

**نەرتلێ:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**نەرچ:** نرکە ف هِن کردن خسته.

**نەرچە:** نرکە ف هِن کردن خسته.

**نەڕچە:** بەچکە وشتری نێر ف شُتُر بچّهٔ نرّ.

**نەرخ:** نرخ، بایی، قیمەت ف نرخ.

**نەرخدان:** درکاندنی قیمەت، گوتنی‌بایی ف نرخ چیزی را گفتن.

**نەرخدانان:** بایی‌بۆدانان ف نرخ بر چیزی گذاشتن.

**نەرد:** گەمەی‌تاوڵی ف نرد.

**نەردان:** کایەکردن‌بەتەختەنەرد ف نردبازی.

**نەردانێ:** نەردان ف نردبازی.

**نەردونگ:** ناردیوان، پەیژە، پەیجە، سلەم ف نردبام.

**نەردە:** ۱) دیواری نزم بەدەوری شتێکا؛ ۲) ناردیوان، پەیژە ف ۱) دیوارکوتاه، نرده؛ ۲) نردبام.

**نەردەوان:** نەردونگ ف نردبام.

**نەردێن:** نەردانێ ف نردبازی.

**نەردیوان:** پەیژە، پەیجە، ناردیوان ف نردبام.

**نەڕڕ:** ناوەڕاستی سەرشان‌و پشت: (کلکی دە**نەڕڕی** پشتی نابو، دارەکەی نابوە سەر **نەڕڕی** شانی) ف وسط شانەها و پشت.

**نەڕڕە:** ۱) نەڕڕ؛ ۲) نەڕی دڕندەو دێو: (**نەڕڕەشێر**، **نەڕڕەدێو**)؛ ۳) نارەتە، گوڕە: (ئـەم **نەڕڕەنەڕڕەت** لەچیە، **نەڕڕە** مەکە)، نەڕاندن ف ۱) نگا: نەڕڕ؛ ۲) نرینهٔ درنده و دیو؛ ۳) غریدن.

**نهرز:** جۆرێ تیخ بۆ شیرو خەنجەر ف نوعی تیغ پرنددار.

**نەرزەنێ:** گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**نەرگز:** گوڵێکی سپی ناوزەردی زۆر بۆن‌خۆشـە بنکی هەیەو لەسـەرە بەهاردا دەڕوێ ف نرگس.

**نەرگزجاڕ:** جێگەی لێ‌ڕوانی نەرگزی زۆر ف نرگس زار.

**نەرگزە:** ۱) قیتکەی ناو زێی ماین کە جارنا دەیبڕن؛ ۲) کلێنچکەی سەر دوگی پەز ف ۱) دکمهٔ فرج مادیان؛ ۲) دنبالچهٔ بالای دنبه.

**نەرگزی:** بەڕەنگ‌و بۆنی نەرگز ف همرنگ یا همبوی نرگس.

**نەرگس:** نەرگز ف نرگس.

**نەرگسجاڕ:** نەرگزجاڕ ف نرگس زار.

**نەرگسە:** نەرگزە ف نگا: نەرگزە.

**نەرگسـەجـاڕ:** ۱) نەرگزجاڕ؛ ۲) لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف ۱) نرگس زار؛ ۲) روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**نەرگسی:** نەرگزی ف نگا: نەرگزی.

**نەرم:** ۱) پێچەوانەی زبر؛ ۲) پێچەوانەی ڕەق ف ۱) نرم، ضدّ خشن؛ ۲) نرم، ضدّ سخت.

**نەڕما:** قرتێنە ف نرمادە، سگك.

**نەڕمادە:** نەڕما ف سگك.

**نەرمان:** زەوینی بێ‌بەردو لەکێڵان‌خۆش، پێچەوانەی بەردەڵان ف زمین هموار و نرم.

**نەرمانی:** نەرمان، پێچەوانەی بەردەڵان ف زمین هموار و نرم.

**نەرمایی:** پێچەوانەی ڕەقی ف نرمی.

**نەرمبوُن:** ۱) لەڕەقی تەکینـەوە؛ ۲) بریتی لە ڕازی‌بوُن بە داوایەکی لە کەسێ دەکرێ ف ۱) نرم شدن؛ ۲) کنایه از راضی شدن.

**نەرمژ:** نەرم ف نرم.

**نەرمژاندن:** کارێ‌کردن کە ڕەق نەرم بێ ف نرم کردن سخت.

**نەرمژین:** نەرم‌بوُنی ڕەق ف نرم شدن سخت.

**نەرمك:** گۆشتی بێ‌پێشە ف لخم، گوشت بی استخوان.

**نەرمکاسەر:** بان‌مەڵاشو ف آهیانە.

**نەرمکاگۆها:** شلکەی گوێ ف لالهٔ گوش.

**نەرم‌کردن:** ۱) نەرمژاندن؛ ۲) ڕام کردن، ڕاضی کردن ف ۱) نرم کردن سفت؛ ۲) قانع کردن.

**نەرم‌کڕن:** نەرم‌کردن ف نگا: نرم کردن.

**نەرمکێ:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**نەرمکێش:** بنیادەمی بەسەبرو پشولەسەرخۆ ف مداراکنندە.

**نەرمکێشی:** مدارا ف مدارا.

**نەرمۆ:** ناتۆ، ناتخۆری بێکارە ف طفیلی.

**نەرموُ:** بەحەوسەلە، پشوُلەسەرخۆ ف شکیبا، بردبار.

**نەرموشل:** ۱) شل‌ومل؛ ۲) بنیادەمی بەحەوسەلە ف ۱) نگا: شل‌ومل؛ ۲) بردبار.

**نەرمۆك:** نەرمك، گۆشتی بێ‌پێشە ف لخم، گوشت بی استخوان.
**نەرمۆڵ:** ۱) نەرمی چكۆلەی دلگر؛ ۲) ناوە بۆ ژنان ف ۱) نرم نازی؛ ۲) نام زنانە.
**نەرمۆڵە:** پچكۆلەی نەرم ف نرم كوچولو.
**نەرمونۆڵ:** نەرمی دوور لە زبرایی ف نرم و دور از زبری.
**نەرمونیان:** ۱) بنیادەمی بەسەبرو حەوسەلە؛ ۲) قسەی دوور لە تووڕەیی ف ۱) آدم باحوصلە؛ ۲) سخن ملایم.
**نەرمە:** ۱) نەرمك؛ ۲) كیژی شل‌وملَ؛ ۳) شلكەی گوێ؛ ۴) هەوایەك بە بلوێر ف ۱) گوشت لخم؛ ۲) زیبای رعنا؛ ۳) نرمهٔ گوش؛ ۴) نوایی كە با نی می‌نوازند.
**نەرمهاژۆك:** نەرمونیان ف صبور و آرام.
**نەرمەبڕ:** زمان لووس ف چرب زبان.
**نەرمـەبێژ:** ۱) ئاڵـەبێژ، پارچەی تەنك‌و شاش؛ ۲) دابێژراو بە پارچەی شاش ف ۱) بیزن پارچەای؛ ۲) بیختە با پارچهٔ نازك.
**نەرمەزین:** نمەدزین ف نمد زین.
**نەرمهژاندن:** برێتی لە ڕازی كردن‌و هێنانەڕەدا بەپێ‌هەڵگوتن ف كنایە از راضی كردن بە وسیلهٔ مدح و ثنا گفتن.
**نەرمەساو:** پۆڵای چەقۆتیژكردن ف پولاد چاقو تیزكنی.
**نەرمەغار:** پێچەوانەی چوارناڵە، غاری لەسەرخۆی ئەسپ ف چهارنعل سبك اسب، مقابل تاخت.
**نەرمەقووت:** باش‌جاوینی پارو ف خوب جویدن خوراك.
**نەرمەك:** ژنی نەرمونۆڵ ف زن نسبتاً چاق.
**نەرمەكۆكە:** قفەی سەبرو ئارام ف سرفهٔ نرم.
**نەرمەگا:** زەوی خۆشكراو، چەندهێشە ف زمین چندبار شخم زدە.
**نەرمەگاو:** شەقاوی بچووك ف گامهای نرم.
**نەرمەلۆت:** نەرمەگاو ف گامهای نرم.
**نەرمەلیقە:** لیچق ف لزج.
**نەرمەنەرمە:** كەم‌كەمەو بەسەبر ف نرم‌نرمك.
**نەرمەنیشك:** لەبارو شیاو ف شیك و خوش‌تیپ.
**نەرمی:** پێچەوانەی زبری‌و ڕەقی ف نرمی، مخالف زبری و سختی.
**نەرمێ:** ۱) قسـەی دوانـدنی كیژی جوان؛ ۲) ناوی ژنانە ف ۱) كلمهٔ خطاب بە زیباروی؛ ۲) نام زنانە.
**نەرمیچانْك:** زۆر نەرم ف بسیار نرم.
**نەرمین:** ناوە بۆ ژنان ف نام زنانە.
**نەڕن:** نەچن، بمێننەوە ف نروند.
**نەڕند:** ۱) نەباش؛ ۲) ناشیرین، ناحەز ف ۱) ناپسند؛ ۲) بدشكل.
**نەڕنایش:** ۱) دێڵەدێو؛ ۲) برێتی لە ژنی زەبەلاحی ناقۆڵا ف ۱) دلەدیو؛ ۲) كنایە از زن لندهور.
**نەڕنەڕەشێر:** برێتـی لەزەبەلاحی مرۆترسێن ف كنایـە از لندهور سهمناك.
**نەرو:** نێرتك ف نرهٔ گیاه.
**نەڕۆ:** مەچۆ، دەست‌لەڕۆیشتن بەردە ف مرو.
**نەروپیانزی:** نێرتك پیواز، ئەولقە كە تۆمی تیایە ف نرهٔ پیاز سبز.
**نەرۆك:** ۱) لقی ناوەڕاستی گیا؛ ۲) ژنێ كە مەمكی قیت نیە ف ۱) ساقهٔ اصلی گیاه، نرە؛ ۲) زنی كە پستان برجستە ندارد.
**نەروم:** ۱) بێ‌فەڕ، سووك‌وچرووك؛ ۲) لەخـۆبایی، بادی‌هەوا ف ۱) بی اخلاق پست؛ ۲) مغرور و خودخواە.
**نەڕوما:** نەڕما، نەڕمادە، قرتە ف نرمادە، سگك.
**نەڕۆنەبار:** ۱) بۆدیتن نەشیاو؛ ۲) جێ‌گومان ف ۱) غیرقابل دیدن؛ ۲) جای گمان.
**نەڕۆی:** نەچی، لەسەرچوون‌سوورنەبی ف نكند بروی.
**نەرە:** ۱) داربەڕوی‌زل؛ ۲) زمانەی‌تەرازو ف ۱) درخت تنومند بلوط؛ ۲) زبانهٔ ترازو.
**نەڕە:** ۱) گوڕەی دڕندە، نارەتە؛ ۲) نەڕڕە ف ۱) غرّش درندە؛ ۲) نگا: نەڕڕە.
**نەڕەوا:** ناڕەوا، ناحەق ف نارەوا.
**نەڕەیی:** نێریەتی، نێرایەتی ف نر بودن.
**نەڕەی‌دێو:** نارەتەی دێو ف نعرهٔ دیو.
**نەڕەی‌پشت:** ناوەڕاستی پشت ف وسط پشت.
**نەڕەی‌شان:** سەرشان ف بالای كتف.
**نەرێ:** نە، نەخێر، پێچەوانەی ئارێ ف نە، مقابل آری.
**نەڕی:** ۱) نەچی، نەڕۆی؛ ۲) پێچەوانەی مێوێنەبوون؛ ۳) گوو نەكەی ف ۱) نكند بروی!؛ ۲) نری، نر بودن؛ ۳) نكند برینی!.
**نەریت:** ۱) خدە، خو، ئاكـار؛ ۲) تازەداهاتگ ف ۱) خوی، روش؛ ۲) نوین، مدروز.
**نەڕیت:** گوو نەكەی ف نرینی!.
**نهریز:** نهرز ف تیغ دندانەدار.
**نەرێسات:** نە بەئاشكراو ڕەپ‌و ڕاست ف غیر صریح.
**نەڕی‌مایكی:** نێرەمووك، ئێرەمووك ف نازا.
**نەرێن:** دژ، نەیار ف مخالف، ضد.
**نەرێنی:** دژایەتی، دژمەنی ف مخالفت، ضدیّت.
**نەز:** نەفەس، هەناسە: (**نەزگرە** واتا: نەفەس دەگرێ) ف نفَس، دم.
**نەزا:** ۱) ئەستێور، مێوینەیێ كە نازێ، زگ‌نەكەر؛ ۲) بێچوی نەبو، مناڵی دانەنا ف ۱) نازا؛ ۲) نزاد.
**نەزاكە:** چاوەڕوانی، چەمەڕایی ف انتظار.
**نەزاكـــەت:** ۱) لەسـەرخـۆیی‌و پەسنـدی: (خـانمێ بەنـەزاكـەتە، بەنەزاكەت جوابی‌دامەوە)؛ ۲) ناوی ژنانە ف ۱) نزاكت و لطف؛ ۲) نام زنانە.
**نەزان:** ۱) منـاڵ‌نەبـوون، زگ‌نەكـردن؛ ۲) بێ‌ناوەز ف ۱) بچەنیاوردن، نازابودن؛ ۲) نادان.
**نەزاندراو:** فێم‌نەكری ف معلوم نشدە.
**نەزاندو:** كەسێ كە بێ‌ناوەزانە قسەدەكا ف كسی كە احمقانە حرف می‌زند.
**نەزانست:** لەڕوی بێ‌ئاگایی ف اشتباە.

**نەزانستە:** لەنەزانست ف ندانسته.
**نەزان کار:** ناشی، پێچەوانەی کارامە ف کارندان، ناشی.
**نەزانم کار:** زانای خۆگێل کەر ف مُتجاهل.
**نەزانم کاری:** خۆ بەنەزان ناساندنی ئاگەدار ف تجاهل.
**نەزانەی:** نەزانی ف نادانی.
**نەزانی:** بێ ئاوەزی ف نادانی.
**نەزانین:** نەزانی ف نادانی.
**نەزدیك:** نزیك بەگش بارانداف نگا: نزیك و مشتقّات آن.
**نەزر:** نزر، نەدر ف نذر.
**نەزگرە:** نزگرە، نزگەرە ف سکسکه.
**نەزلە:** نزلە، نوزلە، پەسیوی زۆر سەخت ف سرماخوردگی شدید.
**نەزم:** ۱) جۆر، تەرز؛ ۲) تەکوزی؛ ۳) نەبز، تل‌دانی ڕەگ؛ ۴) هەوای گۆرانی یان هەڵپەڕکێ ف ۱) طور؛ ۲) نظم؛ ۳) نبض؛ ۴) آهنگ ترانه یا رقص.
**نەزمی:** ناوی پیاوانە ف نام مردانه.
**نەزمیە:** پۆلیسی ناوشار ف شهربانی.
**نەزۆك:** نەزا، مێوینەیێ کە بێچوی نابێ ف نازا.
**نەزۆکی:** زارۆنەهێنان، منداڵدارنەبوُن ف نازایی.
**نەزهـ:** ڕوداوی ناخۆش، قەزاوبەلا ف قضا و بلا.
**نەزەر:** ۱) بیر، بڕوا: (بـە نەزەر من وایە)؛ ۲) تمـاشـای یەکتر کردنی نامەحرەم ف ۱) عقیده، رأی؛ ۲) نظر نامحرم.
**نەزەرگە:** جێگای لێ بوُنی پیاوانی خوا ف جای دیدار اولیاء.
**نەزێ:** نەزۆك ف نازا.
**نەزیرە:** چیرۆکی کورت، سەرگوروشتە ف داستان کوتاه.
**نەزیك:** نزدیك بەگش باریەوە ف نگا: نزدیك.
**نەزیلە:** نەزیرە ف داستان کوتاه.
**نەژاخ:** نەجاخ، تەوری گچکە ف تَبَر کوچك.
**نەژاد:** ۱) رەسەن، رەچەڵاك، بنچینە؛ ۲) ژاکاو، سیس ف ۱) نژاد؛ ۲) پژمرده.
**نەژاڕ:** نەجار، دارتاش ف نجّار.
**نەژخۆ:** ۱) ئەدی چۆن؟؛ ۲) بەڵێ وایە؛ ۳) نەخۆ ف ۱) پس چطور؟؛ ۲) آری چنین است؛ ۳) نگا: نەخۆ.
**نەژد:** ۱) قرچ، قرچـــان، چرچ بوُن؛ ۲) تالان، پوُڕ ف ۱) ترنجیدگی، چروکیدگی؛ ۲) چپاول.
**نەژدە:** نژده ف نگا: نژده.
**نەژدڤان:** تالانچی، پوُڕکەر ف چپاولگر.
**نەژدی:** ۱) نزیك؛ ۲) ماڵی تالانی ف ۱) نزدیك؛ ۲) مال یغمایی.
**نەژدینێ:** نەهێزا، بێ کەڵك ف بی ثمر، بی فایده.
**نەژرنایش:** ۱) خۆجوان کردن، خۆڕازاندنەوە؛ ۲) ڕازانەوە ف ۱) خود را آراستن؛ ۲) آراستن.
**نەژگاف:** گزوگومەت، کتوپڕ، لەپڕ ف ناخودآگاه، ناگهانی.
**نەژنەو:** ۱) گوێ کپ، کەڕ؛ ۲) مەبیسە، گوێت لێ نەبێ ف ۱) کر، ناشنوا؛ ۲) مشنو.
**نەژنەوا:** گوێ نەگر ف پند نشنو.
**نەژنەوایی:** ۱) کـەڕی؛ ۲) گوێ نەبیسـی ف ۱) نـاشنوایی؛ ۲) پندنشنودن.
**نەژی:** ۱) بێ گیان، پێچەوانەی گیان لەبەر؛ ۲) توکێکە واتا: نەمێنی ف ۱) بی جان؛ ۲) دشنامی است به معنی بمیری.
**نەساز:** ۱) نەخۆش، لەش بەبار؛ ۲) کەسێ کە دژایەتی دەکاو لە ئاشتی نەبـانـە؛ ۳) لەسـەوداداسەرڕەق ف ۱) بیمار؛ ۲) سازش ناپذیر؛ ۳) سرسخت در دادوستد.
**نەسـاخ:** ۱) لەش بەبار، دەردەدار؛ ۲) ناڕاست، دەغەڵ ف ۱) بیمار؛ ۲) نادرست و حیله‌باز.
**نەساخن:** لەش بەباری، نەساخی، نەخوەشی ف بیماری.
**نەساخی:** نەخوەشی ف بیماری.
**نەساغ:** نەساخ، ناساغ ف نگا: نەساخ.
**نەساغی:** نەخوەشی، نەساخی، لەش بەباری ف بیماری.
**نەستەڕن:** جۆرە گوڵەباخێکی چکۆڵەیە، شیلانی پەروەردەکراو ف گل نسترن.
**نەستەق:** قسەی بەڕاستو لەگاڵتە بەدوُرو پەنداوی ف سخن ارزنده.
**نەستیل:** زیان، زەرەر ف زیان.
**نەستێل:** نالەبار، ناجۆر، بێ جێگە ف بیجا.
**نەستێلە:** مەردو مەردانە، پیاوی پیاو ف رادمرد.
**نەسرەت:** ۱) ئاریکاری لەخواوە؛ ۲) ناوە بۆ پیاوان ف ۱) مدد خدایی؛ ۲) نام مردانه.
**نەسرەوت:** ۱) بزۆز، بێ ئارام؛ ۲) ئاسوُدە نەبو ف ۱) بی آرام؛ ۲) نیاسود.
**نەسـرین:** ۱) گوڵێکی بۆن خۆشـە لە نەرگز دەکا بەڵام زەردە؛ ۲) ناوی ژنانە ف ۱) گل نسرین؛ ۲) نام زنانه.
**نەسعەت:** ئامۆژگاری، نەسێحەت ف پند، اندرز.
**نەسـل:** ۱) پاڵـوێنە، ڕاوەك؛ ۲) کلافەدەزو؛ ۳) پشتێن، کەمەربەند؛ ۴) تۆرەمە ف ۱) پالونه، صافی؛ ۲) کلاف نخ؛ ۳) کمربند؛ ۴) نسل، نژاد.
**نەسنو:** تیخێ کە قەت تیژ نابێ ف تیغی که تیز نمی‌شود.
**نەسوان:** کون نەکران ف ناسفتن، سوراخ نشدن.
**نەسواو:** ۱) تیخی کولی لەسان نەدراو؛ ۲) کون نەکراو، نەسماو ف ۱) تیغ کندشدهٔ سوهان نزده؛ ۲) ناسفته.
**نەسۆت:** شتێ کە بەئاگر ناسوُزێ ف نسوز.
**نەسۆز:** ۱) نەسۆت؛ ۲) بنیادەمی خاوەن بەڵێن ف ۱) نسوز؛ ۲) آدم پای بند به قول و عهد.
**نەسەب:** ۱) ئامادە بۆ کارتێکردن؛ ۲) نەغمە، ڕاڕەو بەژێر زەمین‌دا؛ ۳) تۆرەمە ف ۱) تأثیر پذیر؛ ۲) نَقب، تونل زیرزمینی؛ ۳) نسل و نسب.
**نەسەل:** پاڵوێنە، ڕاوەك ف پالونه، صافی.
**نەسەلنایش:** پاڵاوتن و ساف کردنی تراو ف تصفیه.
**نەسەلنایە:** پاڵێوراوی تراو، تراوی پاڵافتە ف تصفیه شده.

**نەسەلیایش:** نەسەلنایش ف تصفیە.
**نەسەلیایە:** نەسەلنایە ف تصفیەشدە.
**نەسەن:** تەرح و بیچم ف ریخت و قیافە.
**نەسیب:** نسیب، نسیو ف نصیب.
**نەسیبەت:** نسیبەت ف نگا: نسیبەت.
**نەسیحەت:** نسحەت، ئامۆژگاری ف اندرز.
**نەسیو:** نسیو، نەسیب ف نصیب.
**نهش:** بێهۆش، دڵ بوڕاوە ف مدهوش.
**نەشارەزا:** ناشارەزا، نابەڵەد ف نابلد، ناوارد.
**نەشاسە:** ١) ناڕەوا؛ ٢) ناقابیل ف ١) ناروا؛ ٢) ناشایستە.
**نهشت:** ١) لەعـاسمـانـەوە هاتـەسەرزەمین؛ ٢) ڕێگەی نەدا ف ١) از آسمان بر زمین آمد؛ ٢) نگذاشت.
**نهشتن:** ١) لەحەواوە هاتنەسەرزەمین؛ (تەیر نهشت)؛ ٢) ڕێگەنەدان ف ١) فرودآمدن بر زمین؛ ٢) نگذاشتن.
نهشتۆك: جێگەی نهشتنی باڵداران ف فرودگاە.
**نەشتەر:** شفرەی دەستی برینگەر ف نیشتر.
**نەشتەردان:** نەشتەرلێدان، هەڵدڕینی بەنەشتەر ف جرّاحی.
**نەشتەرکار:** برینگەر ف جرّاح.
**نەشتەرکرن:** هەڵدڕینی بە نەشتەر، برینگەری ف جرّاحی.
**نەشتەرگەر:** نەشتەرکار ف جرّاح.
**نهشتی:** ١) نشتـو، لەحەواوە بۆ سەرزەمین هاتگ؛ ٢) بریتی لە پیاوی سەنگین و گران ف ١) فرود آمدە؛ ٢) کنایە از آدم باوقار.
**نەشخۆر:** قەسەڵی بەرماوی ماڵات ف پس‌ماندۀ علف در آخور.
**نەشر:** بڵاوبـوونـەوەی مەردم بە سارای قیامـەتا. دەگەڵ حەشر دەڵێن: (حەشر و نەشر) ف حشر ونشر.
**نەشـرە:** ١) قاقـەزو پارچـەی باریکی ڕەنگـاوڕەنـگ کە بۆ جوانی بەدیواریەوە دەخەن؛ ٢) نوسراوی کۆمەڵێك کە بڵاودە کرێتەوە، بڵاڤۆك ف ١) نوار رنگی کە بە دیوار خانە آویزند؛ ٢) نشریّە.
**نەشس:** نشست، نەهامەتی ف بدبیاری، اُفول.
**نەشم:** لەنجەو ناز. دەگەڵ کەشم دەڵێن: (خانمێکی زۆر بەکەشم و نەشم لێرەبو) ف خرام و ناز.
**نەشمیل:** ١) جوانی خونچیلانەی دڵڕفێن، دەلال؛ ٢) ناوە بۆ ژنان ف ١) زیبای دلکش و نازك اندام؛ ٢) نام زنانە.
**نەشمیلانە:** نەشمیل ف نگا: نەشمیل.
**نەشمیلە:** نەشمیل ف نگا: نەشمیل.
**نەشناس:** بێگانە، پێچەوانەی ناس و ناسیاو ف ناشناس.
**نەشۆر:** ژنێ کە لە عوزر وەستاوە ف یائسە.
**نەشە:** ١) کەیف، شادی؛ ٢) سەرەتای مەستبوون ف ١) کیف، سرور؛ ٢) اوّل مستی.
**نەشەگرتن:** کەیف‌سازبوون ف سرنشاط آمدن.
**نەشەهەرزا:** ١) ناشارەزا، ناشی؛ ٢) بریتی لە لەکارنەزان ف ١) ناشی؛ ٢) کنایە از ناوارد.

**نەشێ:** ناتانێ، ناتوانێت، لەدەستی نایە ف نمی‌تواند.
**نەشیرین:** ناحەز، دژی جوان، ناشیرین ف بدشکل.
**نەشیان:** نەتوانین، لەدەست نەهاتن ف نتوانستن.
**نەشێم:** ناتوانم، ناتانم، پێم‌ناکرێت ف نمی‌توانم.
**نەع:** نە، نەء ف نە.
**نەعتك:** ئەنی، توێڵ، ناوچاوان ف پیشانی.
**نەعرە:** نارەتە، نەڕڕە ف نعرە.
**نەعرەتە:** نەعرە، نارەتە ف نعرە.
**نەعـل:** ١) ناڵ؛ ٢) سوڵ، پێڵاوی سفـك کە بەسەرپێوە دەکرێ ف ١) نعل؛ ٢) دمپایی.
**نەعلەت:** نەحلەت، لەعنەت ف لعنت.
**نەعنا:** ناعنە ف مرزە.
نەعنە: نەعنا ف مرزە.
**نەعنە کێویلکە:** جاترە ف نعنا کوهی.
**نەعوزو بیللا:** خوایە پەنا بەتۆ ف حرف پرهیز از بلا، نعوذُباللّە.
**نەغد:** ١) پێچەوانەی قەرز؛ ٢) پارەی لەسکەدراو، نەخت ف ١) نقد، مقابل نسیە؛ ٢) نقد، پول، مقابل جنس.
**نەغدوبوخت:** نەخت‌وبوخت ف نگا: نەخت‌وبوخت.
**نەغدینە:** گەنجینە، نەختینە ف گنجینە.
**نەغم:** ١) ڕێگە بەبن عەرزا؛ ٢) قوچ‌وەشاندنی کەڵ لەبەر خۆوە ف ١) نقب، راە زیر زمینی؛ ٢) پیش خود حملەبردن قوچ.
**نەغمە:** ڕەهەند، ڕێگە بەژێر زەویدا ف نقب، راە زیر زمینی.
**نەغـەدە:** شارێکـە لە نێوان شنـۆ و مەهاباد لە ناوچەی سندوس ف نام شهری است.
**نەف:** قازانج، فێدە، بەهرە، قازانج ف سود، فایدە.
**نەفام:** بێ‌ئاوەزا ف نفهم.
**نەفت:** تراوێکی بۆگەنیوە لە کان دەری دەخـەن بۆ ئاگر و ڕونـاکـایی زۆر بەکارە ف نفت.
**نەفتـالین:** دەرمـانێکی بۆن‌ناخـۆشـە لە زاخ دەکا لە خوری و لیباسی دەدەن تا جانەوەر نەیخوا ف نفتالین.
**نەفتاوی:** نەفت پێوەنوساو، تێکەڵ بە نەفت ف نفت‌آلودە.
**نەفتخانە:** کانی نەفت ف معدن نفت.
**نەفح:** قازانج ف نفع، سود.
**نەفـر:** ١) شاخی ماڵات؛ ٢) هەرچی وەك شاخ قیت‌بێت ف ١) شاخ حیوانات؛ ٢) هرچەمانند شاخ برجستە باشد.
**نەفرە:** نفرە ف نگا: نفرە.
**نەفری:** دەرکراو ف راندەشدە.
**نەفرین:** نفرین ف نفرین.
**نەفس:** ١) خاوەن‌گیان؛ ٢) دڵ و دەروون: (نەفسم بۆ گۆشت دەچێ) ف ١) جاندار؛ ٢) نَفس.
**نەفس‌پێت:** ١) هێدی و هێمن؛ ٢) زاڵ بەسـەر ئارەزوی خۆیدا ف ١) شکیبا؛ ٢) مُسلّط بر نفس.

**نەفس کەوتش:** ئیشتیای چو یە ف اشتها کرد.
**نەفسەك:** نەوسن، چلێس ف شکم‌پرست.
**نەفوُرات:** نفوُرات ف نگا: نفوُرات.
**نەفەر:** تاکەکەس ف نفر.
**نەفەرات:** زۆرکەس ف نفرات.
**نەفـــەرمـا:** جگـە لە هێزی چەکـدار، مرۆی دورلـە سەربـازی بەڵام چەك بەدەس ف بسیجی.
**نەفـەس:** هەناسە، کزەبایەك کە لەناو دەم‌و سیپەلاکدا دێت‌و دەچێ ف نَفس، دَم.
**نەفەقە:** خەرجی خێزان ف هزینۀ افراد خانواده.
**نەفەل:** ۱) گیایەکی بۆن‌خۆشە؛ ۲) لەوەڕی تەڕ، سێوەڕە ف ۱) گیاهی است خوشبو؛ ۲) علف سبز.
**نەڤا:** هەوای گۆرانی، ڕەوتی ستران ف آهنگ، ترانه.
**نەڤازە:** زیاد لە پێویست ف بیش از حدّ لازم.
**نەڤروٚز:** ئێکەم‌ڕۆژی بەهار ف نوروز.
**نەڤس:** زڕ، زڕکوڕ، زڕکچ ف ناپسری و نادختری،
**نەڤسی:** زڕکوڕ ف ناپسری.
**نەڤش:** ۱) بنەوشە؛ ۲) ڕەنگی بنەوش، مۆر ف ۱) بنفشه؛ ۲) رنگ بنفش.
**نەڤی:** ۱) فرزەندی فرزەند، نەتەوە؛ ۲) نزم ف ۱) نوه؛ ۲) پست.
**نەڤیان:** ناخۆش‌ویستن، ناخۆش گەرەك بوُن ف تنفّر.
**نەڤیچڕ:** نەتیژە، نەتیجە ف نبیره، فرزند نوه.
**نەڤیچڕك:** ۱) نەڤیچڕ؛ ۲) نەدیدە، نەڤی نەوە ف ۱) فرزندنوه؛ ۲) نوۀ نوه.
**نەڤیچی:** نەڤیچڕك ف نگا: نەڤیچڕك.
**نەڤیس:** نوێس، نوُس ف نویس.
**نەڤیساندن:** نڤیساندن، نوُسین ف نوشتن.
**نەڤینا:** وازوازی، بەخۆنەوەستاو ف لاقید، بی‌اراده.
**نەق:** ۱) پەڕینـی پەلکی چاو، پەڕینی پیلو؛ ۲) بژاردە، هەڵبـــژاردە؛ ۳) خوست، نق ف ۱) پرش پلك چشم؛ ۲) انتخاب؛ ۳) کمترین صدا.
**نەقار:** بەردتاش ف سنگتراش.
**نەقارم:** ناتوانم ف نتوانم.
**نەقارە:** دەهوڵ‌و کەڕەنا ف کوس و کرنا.
**نەقارەخانە:** جێگەی دوڵ‌و زوڕنالێدان ف نقاره‌خانه.
**نەقاڵ:** قسەخۆش ف خوش گفتار.
**نەقام:** ۱) قام، مقام، نقام، گۆرانی؛ ۲) هەوای گۆرانی ف ۱) ترانه؛ ۲) آهنگ.
**نەقان:** ۱) بژاردن، هەڵبژاردن؛ ۲) نقەکردن، دەنگی زۆر بۆخۆهێنان ف ۱) انتخاب؛ ۲) صدای فشار بر خود آوردن و زورزدن.
**نەقاندن:** ۱) بژارتن؛ ۲) نقەکردن ف ۱) انتخاب کردن؛ ۲) صدای زورزدن.
**نەقتاندن:** ئارەقەکردن، خوەدان ف عرق کردن.

**نەقـر:** ۱) قوُڵ، کوُڕ، قوُیل؛ ۲) دەفـری قوُڵ‌و گوشاد ف ۱) عمیق؛ ۲) ظرف گود و گشاد.
**نەقرا:** دەهوڵ، دەوڵ، دوڵ ف دُهُل.
**نەقش:** نەخش ف نقش.
**نەقشە:** نەخشە، خەریتە ف نقشۀ جغرافیا.
**نەققاش:** ۱) کەسێ کە بە قەڵەم لەسەر کاغەز شکڵ دەکێشێ؛ ۲) کەسێ کە دارودیوار ڕەنگ‌دەکا ف ۱) نقّاش هنرمند؛ ۲) نقّاش ساختمان.
**نەققـاشی:** ۱) کێشـانی شکڵ بە قەڵەم؛ ۲) ڕەنگ‌کردنی دیوار ف ۱) نقّاشی؛ ۲) رنگ‌آمیزی ساختمان.
**نەققاڵ:** نەقاڵ، قسەزانی قسەخۆش ف خوش گفتار، بذله‌گو.
**نەققـــە:** ۱) نقـــە، دەنگی زۆربـــۆهـــاتن: (ئـەو **نەققـەیەت** لەچیە؟، **دەنەققێنێ**)؛ ۲) جۆرێ ماسی ف ۱) صدای زورزدن؛ ۲) نوعی ماهی.
**نەقل:** بەرۆشی‌مەزن، مەنجەڵی گەورە ف دیك بزرگ.
**نەقـــڵ:** ۱) گوێزانـــەوە؛ ۲) چیرۆك، بەســـەرهـــات، نەزیرە، نەزیلە، سەرگوروشتە ف ۱) انتقال؛ ۲) سرگذشت.
**نەقلەك:** کەڕەتێ، دەحفەیەك، جارێك‌لەجاران ف یکبار.
**نەقور:** دەنوُك، دەندوُك، نکل ف منقار.
**نەقوس:** نقورچ، نقورچّك ف نیشگون.
**نەقوسکی:** نەقوس ف نشگون.
**نەقـەب:** ۱) شیوەلـە، دەڕەی تەنگـەبەر؛ ۲) نەغمە؛ ۳) لەو گوندانەی کوردستـانە کە بەعسی کاولیان کرد ف ۱) درّۀ تنگ؛ ۲) نقب، تونل زیرزمینی؛ ۳) روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.
**نەقەنۆ:** بێ‌فەڕ، بەدفەڕ، شەڕانی، بێ‌ئاکار ف ستیزه‌جو.
**نەقی:** ناهەقی، زوڵم، دەست‌درێژی ف ظلم، تعدّی.
**نەقیان:** فڕینی‌چاو، پەڕینی پیلوی چاو ف پرش پلك چشم.
**نەقـیزە:** دارێ کە نوُکـێکی ئاسنی تیژی دەســـەرگیراوە گاو کەری پێ لێ‌دەخوڕن ف غاوشنگ، سیخونك.
**نەقیزەدان:** نەقیزە لەحـــەیوان‌دان بۆ ئاژۆتن ف غوشنبـگ سپـوختن، سیخونك زدن.
**نەقین:** پەڕینی پەلکی چاو، چاوفڕیان ف پرش پلك چشم.
**نەقیە:** نەقی، ناهەقی ف ظُلم.
**نەك:** ۱) مەبـادا، نەبـادا؛ ۲) نە ئەمـەی: (**نەك** تۆم ناوێ کەسی تریشم ناوێ) ف ۱) مبادا؛ ۲) نه‌اینکه.
**نەکا:** نەبێ، نەقەومێ ف نکند.
**نەکاڵ:** شێونەبڕاو ف شخم نزده.
**نەکاو:** نشکاف، ناکاو، کتوپڕ ف ناگهانی.
**نەکای:** ۱) ئێستە، نهوٚ؛ ۲) تائێستەش ف ۱) اکنون؛ ۲) هنوزهم.
**نەکردو:** پێچەوانەی کراو یان کردە ف ناکرده.
**نەکردە:** نەکردو ف ناکرده.
**نەکس:** ۱) نەخـۆشی سەرمـابوُن کە سیپەلاك دێشێ؛ ۲) باری میری قاپ، شەگگە، تەنیشتی قوُلی میچ ف ۱) بیماری ذات‌الرّیه؛ ۲) طرف

**نێوبـەنێو:** ناوبـەنـاو: (سـەرجۆنی تەختی ڕۆینی سەرداری پێ‌دەوێ/ خۆشیمە لەو شەهادەتی شێخانە **نێوبەنێو**) «سەیف» [ف] گاەبەگاهی.

**نێوت:** ناڤێ تە [ف] اسم تو.

**نێوتا:** ناڤبار [ف] میان بار.

**نێوتان:** ۱) تیغە. نێوان؛ ۲) ناڤێ ڤە [ف] ۱) تیغە؛ ۲) نام شما.

**نێوجەرگە:** ناوجەرگە [ف] وسط، جرگە.

**نیوجەغز:** لەتێ لە کۆز [ف] نیمدایرە.

**نێوجەغز:** ناوجەغز [ف] وسط دایرە.

**نێوجێژنان:** مانگی دوای شەشەلانو بەرلە قوربان، ناوجەژنان [ف] ماه ذیقعدە.

**نێوچاو:** ۱) بەینی دوبرۆ؛ ۲) دوڕچاو [ف] ۱) وسط دو ابرو؛ ۲) وسط چشم.

**نێوچاوان:** تویڵ، ناوچاوان، ناوچەوان، ئەنی [ف] پیشانی.

**نێوچاوان‌پاك:** نوڕو ناوچەوان‌پاك [ف] شخص نورانی.

**نێوچاوان‌پیس:** شوم، نەحس [ف] نحس، شوم.

**نێوچاوان گرژ:** ڕوترش [ف] اخمو.

**نێوخۆ:** ناوخۆ [ف] نگا: ناوخۆ.

**نێودار:** بەناوبانگ [ف] نامدار.

**نیوداشت:** نیمداشت [ف] نیمدار، نیمداشت.

**نێودەست:** بەتالایی مابەینی هەردو پەلی پێشەوەی یەکسم، ناودەست [ف] میانهٔ هردو دست ستور.

**نێودەشت:** لەو گونـدانـەی کوردستـانـە کە بەعسی کاولیان کرد [ف] روستایی در کردستان کە بعثیان آن را ویران کردند.

**نیوڕان:** نیمەڕۆ [ف] نیمروز، ظهر.

**نێوڕان:** ناوگەڵ [ف] میان رانها.

**نیوڕانێ:** لە دەمی نیمەڕۆدا [ف] در هنگام ظهر.

**نیوڕۆ:** نیمەڕۆ [ف] ظهر.

**نیوڕوُ:** ۱) نیمرو، خاوروُن؛ ۲) نیمەڕوُ [ف] ۱) نیمرو؛ ۲) نیمرخ.

**نێوڕوان:** ۱) ناوڕوان، ناوچـۆمـان؛ ۲) ناوی چەند ئاوایی [ف] ۱) وسط رودخانە؛ ۲) نام چند آبادی.

**نێورین:** بەنەرمە گۆرانی گوتن [ف] ترنّم کردن.

**نێوك:** ۱) نافك، ناوکی زگ؛ ۲) دەنکی میوە [ف] ۱) ناف؛ ۲) هستە.

**نیوکاسە:** دەفری بچوك لە چینی [ف] نیم کاسە.

**نێوگۆڕك:** ناوگۆڕك [ف] ۱) آتشدان وسط خانە؛ ۲) صحن مجلس.

**نیوگەز:** نیم‌گەز [ف] ۱) نیم زرع؛ ۲) نیم زرعی.

**نێوگەڵ:** ناوگەڵ [ف] میان رانها.

**نێوماڵ:** ناوماڵ [ف] نگا: ناوماڵ.

**نێون:** ناوی ئێمە [ف] نام ما.

**نێونان:** ناڤ‌دانین، ناونان [ف] نام نهادن.

**نێونجی:** ۱) ناونجی، دەستـە؛ ۲) فرزەنـدی نێوان گەورەو گچکە؛ ۳) ناوبژیکەر [ف] ۱) میانە، متوسّط؛ ۲) فرزند بین بزرگ و کوچك؛ ۳) میانجی.

**نێونیرە:** دو داروکەی قیت لەناوەڕاستی نیری ملی گاجوتدا [ف] دوچوب کوچك وسط یوغ.

**نێوو:** ناوتان، نێوتان [ف] نام شما.

**نیوە:** نیم، نیڤ، نیڤی [ف] نصف.

**نێوە:** گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد [ف] از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**نیوەچڵ:** کـاری ناتەواو: (بە **نیـوەچڵ** مایەوە تەواوت‌نـەکرد) [ف] ناتمام، نیمەتمام.

**نیوەر:** نوێنەر،بریکار [ف] وکیل.

**نێوەڕاس:** تەواو لەناوەندا، ناوەڕاس [ف] وسط.

**نێوەڕاست:** نێوەڕاس، ناوەڕاس [ف] وسط

**نیوەڕۆ:** نیڤرۆ، نیڤران [ف] ظهر.

**نیوەڕوُ:** نیمەڕوُ، لایەکی ڕوخسار [ف] نیمرخ.

**نیوەڕۆژە:** فراوین، نانی نیوەڕۆ، نەهار [ف] ناهار.

**نیوەڕۆیێ:** نیوڕانێ، لەکاتی نیوەڕۆدا [ف] در هنگام ظهر.

**نیوەڕێ:** نیڤی ڕێکێ [ف] نیمە راه.

**نێوەس:** ۱) نەخۆش، نەساغ؛ ۲) ناخۆش، بێتام [ف] ۱) بیمار؛ ۲) بدمزە.

**نێوەسانی:** نەخۆشی، لەش بەباری [ف] بیماری.

**نێوەش:** ۱) نەخۆش، نەساغ؛ ۲) تام‌ناخۆش [ف] ۱) بیمار؛ ۲) بدمزە.

**نێوەشاگەدی:** ژنی زكپڕ [ف] زن حاملە.

**نێوەشانی:** نەخۆشین، لەش بەباری [ف] بیماری.

**نیوەشەی‌عەیەلەی:** زكپڕی ژن [ف] حاملگی زن.

**نیوەشۆ:** سوێنکەسابوُن [ف] تەماندهٔ صابون.

**نیوشـۆر:** ۱) نیوەشـۆ؛ ۲) باش نەشـۆراو، خاس نەشـۆریاگ [ف] ۱) تەماندهٔ صابون؛ ۲) خوب ناشستە.

**نیوەشـەڕ:** شەڕەجوێن‌و چنگەپرچە: (شەڕو نیوەشەڕ هەر یەکێکە) [ف] نزاع لفظی و دست بە یقەشدن.

**نێوەشەن:** نەخۆشین، لەش بەباری [ف] بیماری.

**نیوەشەو:** نیڤاشەوێ [ف] نیمەشب.

**نیوەشەوی:** قامێکی کۆنە لەچەشنی حەیرانو لاوك [ف] آهنگی است قدیمی.

**نیوەشەوێ:** لە دەمی نیوەشەودا [ف] در نیمەشب.

**نێوەشەی:** ۱) نەخۆشین، لەش بەباری؛ ۲) ناپەسەند؛ ۳) زكپڕی [ف] ۱) بیماری؛ ۲) ناپسند؛ ۳) حاملگی.

**نێوەشی:** ۱) نەخۆشین؛ ۲) تام‌ناخۆشی [ف] ۱) بیماری؛ ۲) بدمزگی.

**نێوەشینە:** نەخۆشین [ف] بیماری.

**نێوەشی‌یە:** نەخۆشی، لەش بەباری، نەخوەشی [ف] بیماری.

**نیوەك:** نیڤەك [ف] نگا: نیڤەك.

**نێوەك:** چاکی، چاکە [ف] نیکی، کار نیك.

**نیوەکا:** نیڤەکا [ف] نگا: نیڤەکا.

**نیوەکار:** نیڤەکار [ف] نگا: نیڤەکار.

**نیوەکارە:** ناتەواو [ف] نیمەکارە، ناقص.

**نیوەکاری:** کاری نیڤەکار [ف] کار نیم بر کشاورزی.

**نیوه گا:** تاکه گایەك لە دوگای جوت: (به **نیوه گایەك** ناکێلدرێ) ف کنایه از یك گاو شخم زن.

**نیوه گیان:** نیمه گیان ف نیمه جان.

**نیوه مردو:** نیوه گیان ف نیمه جان.

**نیوه ند:** ناوەند، ناوەڕاست، چەق ف وسط.

**نێوه ند:** مۆرانه ف نگا: مۆرانه.

**نێوه ندا:** نەخوێندە، فێرەسیوات نەبوگ، بێ سیوات ف بی سواد.

**نێوه نده:** نێوەندا ف بی سواد.

**نیوه نمـــه ك:** ئاردی بەئـــاوشێلدراوی گەرم کە لەســـەر برین و دومـەڵ دادەندرێ ف خمیر روغن مال داغ که بر دُمَل و زخم نهند.

**نیوه یی:** شەریکی ف شراکت نصفه.

**نیه:** بێ بەشە لە بون ف نیست، وجود ندارد.

**نیهاد:** ۱) دڵ و دەرون؛ ۲) ناوه بۆ پیاوان ف ۱) نهاد، احساس درونی؛ ۲) نام مردانه.

**نیهال:** لقی دار، لکی درەخت ف شاخهٔ درخت.

**نیهان:** گان، کوتان ف جماع.

**نیهانی:** ناشی، تازەکار، ڕانەهاتو لەکار ف ناشی.

**نیهایەت:** ۱) دوماهی، ئاخری؛ ۲) ناوی ژنانه ف ۱) سرانجام؛ ۲) نام زنانه.

**نیەت:** ۱) ڕۆژی سەرەتای ڕەمەزان: (کەنگێ **نیەتە**؟)؛ ۲) نیاز، قەست ف ۱) روز اوّل ماه رمضان؛ ۲) قصد.

**نیەتمـە:** نیازم وایە، قەستم وایە، وشـەی دەستپێکردنی نوێژ و ڕۆژو ف قصد دارم، نیّت کردم، کلمهٔ آغاز فرائض دینی.

**نیەتهاوردن:** بڕیاردان بۆ نوێژکردن یا ڕۆژوگرتن یان دەسنوێژشوتن ف نیّت کردن برای انجام فریضه.

**نیەتهێنـان:** بڕیاردان بەزمان بۆ بەجێهێنانی نوێژ و دەسنوێژ و گرتنی ڕۆژو، نیەتهاوردن ف نیّت کردن برای انجام فریضه.

**نیەتی:** ۱) شك نابـا، لای نیە: (نـالی **نیەتی** سیحری بەیان حیکمەتی شێعرە / ئەمما هەیەتی قووەتی دڵ قودرەتی ئینشا) «نالی»؛ ۲) نیازی، مەبەستی ف ۱) ندارد؛ ۲) قصدش، منظورش.

**نیەر:** مینبەر، جێگەی بەرز تایبەتی بەقسەکەر ف منبر.

**نیەســـراوه:** لەو گونـدانـەی کوردستـانـە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**نێ هەرێ:** نەخەیر، نا، نەبەڵێ ف خیر، نه.

**نی یی:** ۱) ئەمە؛ ۲) ئەمانە ف ۱) این؛ ۲) اینها.

**و**: ١) پیتی بادانـەوە: (چـوُمـەشـارو چوُمەوە گوند)؛ ٢) پیتی پێوەندی: (قـەڵتوبـڕ، بابو کوڕ، دارو دەوەن)؛ ٣) سەیرمان دەگەیەنێ: (سەگ و مزگەوت؟!، تۆو قومـار؟!)؛ ۴) نیشانەی بەرکاری: (پێ کراو، لێدراو)؛ ۵) نیشـانـەی پەسن و چۆنیەتی: (نـوستو، مردو)؛ ۶) نیشانی کۆ بۆ ئەوانـەی دەدوێنـرێن: (چوُکـرد؟، چوُنـەکـرد؟، گوتم ئەم کارە بکـەن کردوُ؟)؛ ٧) لا، ئالی: (خـــواروُ، ژوُروُ، ژێروُ)؛ ٨) دوبـارە: (هـاتـەو، گەڕاوەسەو، گەڕانمەو)؛ ٩) مانای «بە» دەگەیەنێ: (ولا، وسان)؛ ١٠) بەمانا ئەم، ئەو: (وتۆ، واتا: ئەوجۆرە، ئەمجۆرە)؛ ١١) نیشانی نێرینە. دەکەوێتە پێش قسە: (وگوت، واتا: پیاوەکە گوتی، وهات، واتا: پیاوەکە هات)؛ ١٢) بزاوی بۆر، بەرکە *لەشوێن* پیت دێ: (کوڵ، کورد)؛ ١٣) دەگەڵ، رەگەڵ: (ماڵ و مناڵەو هاتگن) ف ١) حرف عطف؛ ٢) حرف اتّصال؛ ٣) حرف تعجّب؛ ۴) علامت مفعولی؛ ۵) از ادات توصیفی؛ ۶) علامت جمـع مخاطب؛ ٧) سو، طرف؛ ٨) باز، دوباره؛ ٩) با، به؛ ١٠) این طور؛ ١١) ضمیر مذکّر که *پیش از کلمه آید*؛ ١٢) علامت ضمّه که *بعد از حرف آید*؛ ١٣) حرف همراهی، با.

**وٚ**: ١) لەپاش ناو نیشانەی نێر بوُنی خاوەن‌ناوە: (حەموٚ، رەشوٚ، مستوٚ)؛ ٢) پاشگـــرێکـــە زۆرو زێدەیی دەگەیەنێ: (مـەکـروٚ، زیانی‌خوروٚ)؛ ٣) خەبـەردان: (مـەیوٚ بەمانا دێت، مەواروٚ واتا: دەبارێ)؛ ۴) پاشگری پاڵدان: (واروٚمانای بەهاری یا جوچکەی بەهارە) ف ١) پسوند ضمیر مذکّر؛ ٢) پسوند مبالغه؛ ٣) پسوند خبری، می؛ ۴) پسوند نسبت.

**وا**: ١) ئاوها، بەمجۆرە؛ ٢) کە، بۆ دیاری کردنی باسکراو: (کاوراکەی **وا** هاتـەلات)؛ ٣) ئەوا، هەر ئیسـە: (خـۆت بگرە **وا** هاتم)؛ ۴) ئەوەتا، ئەوەیە: (**وا** لەمـالا، **وا** لەجێبمـا)؛ ۵) بەمـانـا نزیکی: (**وا** وەرە)؛ ۶) دوُری: (**وا** رۆیی نازانم کوێوە چو)؛ ٧) کردنەوەی بەندکراو: (گرێکە واکـە، درگام واکـرد)؛ ٨) شلی و تراوی چێشت ئەگەیەنێ: (دۆخەوا، شۆروا)؛ ٩) دەم، کات: (لـە وای بەیانـدا هاتم نەبـوی)؛ ١٠) کەر، کارکـەر: (نـانـەوا)؛ ١١) با، بێ: (وای شەماڵ تێت)؛ ١٢) خوشك، خوەهـ، خویشك؛ ١٣) ئا، ها؛ ١۴) خۆزی، کاشکی، کاشکا، شەلا ف ١) این طور؛ ٢) که، حرف تعریف؛ ٣) اینك؛ ۴) این است، موجود است؛ ۵) نزدیك‌تر؛ ۶) دورتر؛ ٧) بازکردن، گشودن؛ ٨) آش آبکی، با؛ ٩) هنگـام؛ ١٠) پسوند فاعلی؛ ١١) باد وزیدنی؛ ١٢) خواهر؛ ١٣) هان؛ ١۴) کاشکی، ای کاش.

**وائیرێن**: سەرپەرستی ماڵ و خێزان، گەورەی ماڵ ف سرپرست خانواده.

**وابا**: ئەمجۆرە بوایە ف اگر چنین می‌بود.

**وابزا**: ئەمجۆرە بەخەیاڵتا بێت، بڕوات وابێ ف انگار، چنین پندار.

**وابزانە**: وابزا ف انگار.

**وابو**: ١) ئاوها رۆی‌دا؛ ٢) کرایەوە ف ١) چنین بود؛ ٢) بازشد.

**وابۆ**: باشە، باوابێ ف اشکالی ندارد.

**وابوُن**: ١) بەمجۆرەبوُن؛ ٢) کرانەوە ف ١) چنین بودن؛ ٢) بازشدن.

**وابە**: ١) ئەمجۆرە بە؛ ٢) دە بکرێوە ف ١) چنین باش؛ ٢) بازشو.

**واپۆك**: رەمۆك، قوشقی و سڵ ف رموك، گریزپا.

**وات**: ١) بەجـــۆرێکت: (**وات** لێ‌دەکـەم، **وات** بۆدەکـەم)؛ ٢) گوتی، قسەی کرد؛ ٣) دەگەڵت: (**وات** قسیە ئەکەم)؛ ۴) پاشگری نیشانەی کۆ: (سـەوزەوات) ف ١) چنینت، چنـانت؛ ٢) گفت؛ ٣) باتـو؛ ۴) علامت جمع.

**واتا**: بەمانا، نیاز لە: (ئێژم بچۆ **واتا** برۆ دە تێ‌بگە!) ف به معنی، یعنی، چنین استنباط می‌شود.

**واتانێ**: واتا، وا دەگەیەنێ ف یعنی، چنین می‌رساند.

**واتر**: ١) بەمجۆرەو پتر؛ ٢) دوُرتر: (**واتر** بچۆ)؛ ٣) نزیك‌تر: (**واتروەرە**) ف ١) چنین و چنان‌تر؛ ٢) دورتر؛ ٣) نزدیك‌تر.

**واتش**: ١) وتی، گوتی؛ ٢) ئاخافتن، قسیەکردن ف ١) گفت؛ ٢) سخن گفتن.

**واتن**: گوتیان ف گفتند.

**واتۆ**: شایعە، قسەی سەرزاری خەڵك ف شایعه.

**واتووڕی**: واتۆ ف شایعات.

**واتە**: ١) واتا؛ ٢) قسە؛ ٣) کەوابێ؛ ۴) بەڵێ بەمجۆرەیە؛ ۵) دەنگۆ ف ١)

یعنی: ۲) سخن: ۳) اگر چنین باشد؛ ۴) چنین است؛ ۵) نگا: دەنگۆ.

**واتەنی:** ۱) شیاوی گوتن: ۲) وەك دەڵێ: (کوردە **واتەنی**) ف ۱) سزاوار گفتن، گفتنی؛ ۲) چنانکه گوید، یاروگفتنی.

**واتەواتە:** واتۆ، قسەو باسی ناوخەڵك ف حرف بر سر زبانها، شایعات.

**واتەویرە:** ۱) بیر و خەیاڵ؛ ۲) شەڕەقسە ف ۱) فکر و خیال؛ ۲) جدال لفظی.

**واتەی:** گفتوگۆ ف گفتگو.

**واتی:** گوتی، ئاخافت ف گفت.

**واتیار:** قسەکەر ف گوینده.

**واج:** گێژ، تاس، تاساو: (هاجوواج بوم) ف سراسیمه، گیج.

**واجا:** لانە، لۆنە ف آشیانه.

**واجب:** زۆر پێویست ف واجب.

**واجبی:** داڕو، دەرمانحەمام، نورە ف واجبی.

**واجۆ:** واجب ف واجب.

**واجە:** کولانکە لەدیواردا، دەلاقەی کوناودیو ف روزنه در دیوار.

**واجەر:** شکانی شتی ناسك. بۆ هێلکەی دەڵێن : (خاکە **واجە**رسە بویە) ف شکستن تخم در تخمدان.

**واجەرسە:** شکاوی هێلکە لە هێلکەدانی مریشکا ف تخم شکسته در تخمدان مرغ.

**واچە:** ۱) بێژە، بڵێ؛ ۲) کەلیمە، دەنکێ وشە ف ۱) بگو؛ ۲) کلمه، واژه.

**واخ:** ۱) ئاخ، هاوار لە ئێش: (ئاخ**وواخ** چی بکەم)؛ ۲) پەك، بۆ سەیر؛ ۳) ناوی گوێز لەگەمەی گوێزێندا ف ۱) کلمهٔ واکنش درد، آخ؛ ۲) وه. کلمهٔ تعجّب؛ ۳) نام گردو در گردوبازی.

**واخت:** کات، وەخت، دەم ف وقت، هنگام.

**واخوا:** داواکاری سەرلەنوێ کردنەوەی قسە یا کار ف مستأنف، خواهان تکرار سخن یا کار.

**واخوێن:** کەسانێ کە گۆرانی بۆ قامبێژ دەگێڕنەوە ف همخوان آواز.

**واخێن:** جۆرێ گەمەیە بەگوێز دەکرێ ف نوعی گردوبازی.

**واد:** بەڵێن، سۆز، قەوڵ، گفت ف قول، وعده.

**وادار:** ۱) ناچار؛ ۲) لێزان، پسپۆڕ، ئاگادار لەکارێ ف ۱) وادار؛ ۲) وارد، آگاه.

**وادارتەنە:** ۱) هەڵگرتن، بەرزەوەکردن؛ ۲) لابردن ف ۱) بلندکردن از زمین؛ ۲) برداشتن.

**وادارکران:** ۱) ناچارکران، بەزۆر پێ کران؛ ۲) ئاگادارکران ف ۱) وادار شدن؛ ۲) باخبرشدن.

**وادارکردن:** ۱) ناچارکردن؛ ۲) خەبەرپێدان ف ۱) وادار کردن؛ ۲) آگاه کردن.

**وادارکردنەوە:** ۱) بەئاگاهێنان؛ ۲) وەخەبەرهێنان ف ۱) یادآوری کردن؛ ۲) آگاه کردن.

**واداشت:** وادار ف نگا: وادار.

**وادای:** بادان، بادانی بەنو... ف تابیدن، تاب دادن.

**وادە:** ۱) بەڵێن، گفت، پەیمان؛ ۲) بانگ کردن، خواستن؛ ۳) جەنگە، وەختی شتێ؛ ۴) مۆڵەت، ماوە، قانە؛ ۵) ژوانگە: (**وادە**مان سەری کۆڵانەکە بێ) ف ۱) پیمان؛ ۲) خواستن، احضار؛ ۳) موسم؛ ۴) مهلت؛ ۵) میعاد.

**وادەدان:** بەڵێندان، قەولدان ف وعدەدادن، قول دادن.

**وادەدانان:** ۱) ژوانگە دیاری کردن؛ ۲) ماوە دیاری کردن ف ۱) قرارگذاشتن؛ ۲) مدّت معلوم کردن.

**وادەدانیان:** وادەدانان ف نگا: وادەدانان.

**وادەسەنن:** بەڵێن لەکەسێ ساندن بۆ مەبەستێ ف قول گرفتن.

**وادێ:** لەکاتێکا، ئەودەموچاخە ف زمانی، هنگامی.

**وادی غراب:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**وار:** ۱) جێژیانی تاوسانی لە ئێلاخ؛ ۲) جێگەو شوێن: (لێرەوار)؛ ۳) خوار، خێچ؛ ۴) خوارۆ، ژێرۆ؛ ۵) باری سەرپشتی بارەبەر؛ ۶) پاشگری بەمانا خاوەن: (خوێندەوار)؛ ۷) پارەدان لەجیاتی خەڵك لە چێشتخانەو چاخانە؛ ۸) بەخشش بۆ خاوەنقومارخانە؛ ۹) دارایی و ماڵ: (وارو وێخم چو)؛ ۱۰) پاشگری بەمانا کەسێ کە دەخوا؛ ۱۱) مستەحەق، شیاو: (سزاوار، واتا: شیاوی سزادان)؛ ۱۲) ئەنوا، پەناگا ف ۱) ییلاق؛ ۲) جای، محلّ؛ ۳) کج؛ ۴) پایین؛ ۵) بار؛ ۶) پسوند دارابودن؛ ۷) پول خوراك دوستان را پرداخت کردن در رستوران؛ ۸) انعام به صاحب قمارخانه؛ ۹) دارایی؛ ۱۰) پسوند فاعلی به معنی خورنده؛ ۱۱) شایسته؛ ۱۲) پناهگاه.

**وارئامەیش:** داخوزین، هاتنەخوار لە ژورەوە ف پیاده شدن.

**واراقە:** پەڕەقاقەز ف ورق کاغذ.

**واران:** باران، ئاوێ کە لەعاسمانەوە بەتنۆکە دێتەخوار ف باران.

**وارانن:** باراندن ف بارانیدن.

**وارای:** بارین ف باریدن.

**وارای:** گۆڕان ف تغییر.

**واربای:** پاپەتی، پێخواس، پێخاوس ف پابرهنه.

**واربیایش:** ۱) لە بڵندەوە داگەڕان، هاتنەخوار لە ژورەوە؛ ۲) بەعەرزا کەوتن ف ۱) پیادەشدن؛ ۲) بر زمین افتادن.

**وارتۆ:** مەڵبەندێکە لە کوردستانی بەردەستی ترکان ف ناحیه‌ای در کردستان ترکیه.

**وارخان:** خانوی چەندنهۆمی بێحەوشەوحەسار ف خانهٔ آپارتمانی.

**وارد:** ۱) باروکەی وەهێلکەهاتگ؛ ۲) ئامڕا، رەفیقی رێگە؛ ۳) خواردی؛ ۴) گەیشتو لەسەفەرەوە: (باوکم ئەمڕۆ **وارد** بو)؛ ۵) بردنەوە لە قوماردا ف ۱) جوجەمرغی که تازه تخم می گذارد؛ ۲) همراه؛ ۳) خورد، تناول کرد؛ ۴) رسیده، واردشده؛ ۵) برنده‌شدن در بازی.

**واردش:** ۱) خواردی؛ ۲) خواردەمەنی؛ ۳) ڤەخوارن، خوارنەوە ف ۱) خورد؛ ۲) خوردنی؛ ۳) نوشیدنی.

**واردن:** خواردن ف خوردن.

**واردۆخ:** خۆرا، زۆرخۆر، زگتێر ف پُرخور.

**وارده:** ۱) خوراو، خوریاگ؛ ۲) خواردەمەنی، خۆراك ف ۱)

خوردەشدە؛ ٢) خوراك.

**واردەی:** خواردن ف خوردن.

**وارڕاکرن:** بریتی لە زاروزیچی زۆر خستنەوە ف کنایە از بسیار زاد و وَلَدکردن.

**واردەس:** ١) رەبەن، سەڵت؛ ٢) گۆشەگیر ف ١) بینوا؛ ٢) گوشەگیر.

**وارز:** جاڕز ف پکر.

**وارِز:** درومان، دورمان ف دوخت.

**وارِزدن:** درون، دۆرین ف دوختن.

**وارس:** میراتگر، کەلەپۆرگر ف وارث.

**وارش:** شۆرە، سۆر، دیوار بەدەوری ماڵو باغو بێستاندا ف سور، بارو، دیوار پیرامون باغ و خانە.

**وارشت:** بارش، بارین، بارینی بەفرو باران ف بارش، آمدن باران.

**وارشتش:** بەجێمان، لەجێمانەوە ف بەجای ماندند.

**وارشە:** وارش، سۆر ف دیوار پیرامون خانە و باغ، سور، بارو.

**وارکۆر:** بریتی لە بێ‌عەولاد، وەجاخ‌کۆر ف کنایە از اجاق کور.

**وارکۆز:** زۆم، جێگەلەوەڕی تایبەتی هۆبەی هەوارچیان ف چراگاه ویژۀ ییلاقیان.

**وارکەردش:** داهێنانەوەو خوارکردنەوە ف بەپایین کشیدن و خم کردن.

**وارکەینا:** کچی خویشك، خوشکەزای مێوینە ف دخترخواهر.

**وارگـە:** ١) جێگەی ژیانی تاوسانی؛ ٢)بارگەی سەفەر ف ١) زیستگاه ییلاقی؛ ٢) رخت وبارسفر.

**وارم:** فەرمایشت، قسەی پیاوی ماقوڵ ف فرمایش.

**وارما:** فەرموی ف فرمود.

**وارماوا:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان کە بعثیان آن را ویران کردند.

**وارماوێ:** گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدۀ کردستان توسط بعثیان.

**وارمای:** فەرمۆن، قسەکردنی پیاوی گەورە ف فرمودن.

**وارِن:** ١) خوری‌و کوڵکەی بەچنگ‌ڕناو؛ ٢) بارِن، بەفرێ کە با لەجێی خۆی بزاوتوە ف ١) پشم دستچین؛ ٢) برف بادآوردە.

**وارنایش:** ١) هـاتنەخوار؛ ٢) هێنانەخـوار ف ١) فـرودآمدن؛ ٢) فرودآوردن.

**وارنشین:** ١) نهۆمی ژێرین لە خانو؛ ٢) کەسێ کە لە کوێستان دەژی ف ١) زیرزمین؛ ٢) کسی کە درکوە زندگی می کند.

**وارو:** ئاوەژو ف وارونە.

**وارۆ:** ١) بارۆکە؛ ٢) دەبارێ: (واران مەوارۆ) ف ١) جوجۀ بهاری؛ ٢) می بارد.

**وارِوای:** واربای، پاپەتی، پێخواس، پێخاوس ف پابرهنە.

**وارۆزونـادورۆزا:** پەسرپێرەکە، پترپێری، بەسرپێر، سێ‌رۆژبەرێ ف پَس پریروز.

**وارۆك:** بارۆکە ف جوجۀ بهارە.

**واروندا:** بێ‌عەولاد، وەجاخ‌کوێر ف اجاق کور.

**وارۆواینە:** فڕێدان، تۆڕهەڵدان ف پرت کردن.

**وارِوەندا:** واروندا، بێ‌عەولاد ف اجاق کور.

**وارە:** ١) بارە، دربـارە؛ ٢) باری پچـوك: (دەستـەوارە، مانـای باری دودەست، دەستەوارەیەك نانی هێنا)؛ ٣) خوشك؛ ٤) جار، چەل؛ ٥) قەرزبەقەرز، دەستەواو؛ ٦) پاژ، بەشێ لە چەندیەش: (لە قەرزەکەم دو وارەم لاماوە)؛ ٧) بەهرەی زەمین ف ١)بارە، زمینە؛ ٢) بارکوچك‌کە *با دست حمل شود*؛ ٣) خواهر؛ ٤) دفعە، بار؛ ٥) وام جنس بە جنس؛ ٦) جزء؛ ٧) بهرۀ زمین.

**وارەڕەش:** لەو گونـدانـەی کوردستـانـە کە بەعـسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان کە بعثیان آن را ویران کردند.

**وارەزا:** خوشکەزا، خوارزا ف خواهرزادە.

**وارەسە:** خەبەرپێدان ف آگاهی دادن.

**وارەمانە:** گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدۀ کردستان توسط بعثیان.

**وارەمسە:** رەوینەوە، رەوکردن ف وارمیدن.

**وارِەمەنە:** رەواندنەوە ف رمانیدن، رم دادن.

**وارەوارە:** کەم‌کەمە ف بەتدریج، کم‌کم.

**واری:** ١) جێگەو شوێن: (کوردەواری)؛ ٢) باری: (واران **واری**، وەور **واری**)؛ ٣) پاشگـری بەمـانـا وەکـو، لەگوێن، چون: (بیگانەواری ئەکات) ف ١) زیستگاە؛ ٢)بارید؛ ٣) پسوند بە معنی همانند.

**وارێ:** ١) بارێ، هەرچۆنێ بێت؛ ٢) جارێك ف ١) باری بە هرحال؛ ٢) یك‌بار.

**واریپال:** گوڵێلە، وەنەوشەی دەشتەکی ف بنفشۀ کوهی.

**واریزە:** باوەڕێن ف میوۀ بادربختە.

**واریس:** وارس، میراتگر، کەلەپۆرگر ف وارث.

**واریل:** دەفری‌هەراولەکانزا بۆتراو تێ‌کردن ف بُشکە.

**وارین:** بارین ف باریدن.

**وارێن:** بارێن، باران‌داکەر: (هەورەکە **وارێنە**) ف بارندە.

**واز:** ١) ئیشتیاو ئارەزو: (**وازم لەنیسکێنەیە، وازم لەوکیژەیە بی‌خوازم**)؛ ٢) خۆتێ نەگەیانـدن: (**واز بێنـە، واز** ناهێنم)؛ ٣) کەیفو خۆشحـاڵی: (ئەمڕۆ لەسەر **وازە**، دوێنێ **بێ‌واز** بو)؛ ٤) باز، لەبازدانەوە؛ ٥) ئاواڵە: (درگا **وازە**، ئەم گرێیە **وازکە**)؛ ٦) کار، خو: (**قوماروا‌ز، مەکرواز**)؛ ٧) خواز، داواکـەر: (**جـیایی‌واز، جیاواز**)؛ ٨) ئامـڕا، دەگەڵ: (**واز** تۆ تێمـەشـار)؛ ٩) چزیرگەی پچـوك لەناو ڕوباردا؛ ١٠) کەمێکی جیا: (تـاق‌و **واز** پەیدابـوون)؛ ١١) تێراوی‌و لەشـوقی. بۆ *شینایی دەڵێن*: (دەخڵەکـەت زۆر **بەوازە**)؛ ١٢) وێران، تێکـدراو.*دوای لانـە دەڵێن*: (**لانـەواز**)؛ ١٣) ئامـۆژگاری ئاینی: (مـەلا **واز** ئەخـوێنێ)؛ ١٤) گەمـەدەگەڵ‌کەر: (**کـۆتـرواز، سەرواز**)؛ ١٥) سەرڕێژ: (**وازاو**)؛ ١٦) دیسـان، باز ف ١) اشتهـا،میل؛ ٢) عدم مداخله در کار؛ ٣) حالت مزاجی؛ ٤) پرش؛ ٥) واز، باز؛ ٦) کارو عادت؛ ٧) خواهان؛ ٨) همراه؛ ٩) جزیرۀ ماسـەای در وسط رودخـانـە؛ ١٠) انـدکی جدا شدە از مجموع؛ ١١) شادابی و شکوفایی نباتات؛ ١٢) کنایە از ویران.کە *با*

کلمهٔ «لانه» گویند؛ ۱۳) وعظ؛ ۱۴) بازی کننده با چیزی یا حیوانی؛ ۱۵) لبریز؛ ۱۶) دوباره، باز.

**وازئانین:** دەس‌هەڵگرتن، تەرخ‌کردن ف ول کردن، دست برداشتن.

**وازاڕ:** بازاڕ، بەمانا جێگەی گوشادو فرەهـ ف بازار.

**وازاڕی:** ۱) بازاڕی، برێتی لە کەم‌نرخ؛ ۲) سەوداگەر لەبازاڕا ف ۱) کم بها، بازاری؛ ۲) کسبهٔ بازار.

**وازانی:** پێت‌وایە، وا بیردەبەی ف پنداری.

**وازانین:** ئاوا بیر بردن ف پنداشتن.

**وازاو:** پاشـاو، ئاوێ کە بەخوڕایی لەبەر ئاوداشتن یان لەحەوز دەڕوا ف پساب آبیاری یا لبریز از حوض.

**وازئینان:** وازئانین ف دست برداشتن، ترك کردن.

**وازبێنە:** دەس‌هەڵگرە ف دست بردار.

**وازبێنی:** ۱) خوازگێنی؛ ۲) دەس‌هەڵگری: (لەم‌کارە **وازبێنی** باشە) ف ۱) خواستگاری؛ ۲) اگر دست برداری.

**وازت:** ۱) کەیفت؛ ۲) ئارەزووت ف ۱) مزاجت؛ ۲) آرزویت.

**وازتن:** خواستن ف نگا: خواستن.

**وازح:** ئاشکرا ف آشکار.

**وازدادان:** ئامۆژگاری‌گوتنی ئایینی ف وعظ گفتن.

**وازدان:** وازدادان ف وعظ گفتن.

**وازر:** ۱) بازرە، تەرە؛ ۲) گوێ‌قوڵاخ، لەســەرهـەست ف ۱) ترسیده، فرارکرده؛ ۲) گوش به زنگ.

واز رە: وازر، بازرە، تەرە ف ترسیده، فرارکرده.

**وازکەر:** کەسێ کە بەسترا و دەکاتەوە ف بازکننده، گشاینده.

**وازگۆ:** گێڕانەوەی قسە، دوپاتەکردنەوە ف بازگو، دوباره گفتن.

**وازلێ‌هاوردن:** دەست‌لێ‌هەڵگــرتن، خۆتێ‌نەگەیانـدن ف ول کردن، دست برداشتن از.

**وازلێ‌هێنان:** وازلێ‌هاوردن ف دست برداشتن از.

**وازن:** ۱) تازەخـونچە؛ ۲) دەخوازن؛ ۳) ئاواڵەن؛ ۴) کەیف‌و ئارەزوی ئێمە: (**وازن** لە خزمایەتێ‌یە، **وازن** لە شەڕ نیە) ف ۱) غنچهٔ نودمیده؛ ۲) می‌خواهند؛ ۳) بازهستند؛ ۴) اشتها و آرزوی ما.

**وازو:** ۱) بەم‌نزیکـانە؛ ۲) کەیف‌و ئارەزوی ئێوە: (**وازو** لەشەڕێ‌یە) ف ۱) به این زودی؛ ۲) میل و آرزوی شما.

**وازوازی:** ۱) کەسێ کە هەرکـاتـە لەسـەر خەیاڵێکـە، سەرسەری؛ ۲) هەوەڵ‌گریانی‌زاروك ف ۱) دمدمی مزاج؛ ۲) نخستین گریهٔ نوزاد.

**وازوڵ:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**وازە:** ۱) بـــازە، بازگ، حەیوانی بەڵـەك؛ ۲) زیپکـەی ڕۆوی زاروۆ ف ۱) خلنگ؛ ۲) جوش چهرهٔ کودك.

**وازهانین:** دەس‌هەڵگرتن، وازئانین ف دست برداشتن، ول کردن.

**وازهاوردن:** وازئانین، وازهانین ف دست برداشتن.

**وازهێنان:** وازئانین، وازهاوردن ف دست برداشتن.

**وازی:** ۱) خوازی، پاشگـرە لە خواستن: (ژن‌و ژن‌**وازی**)؛ ۲) گەمـەو گاڵتە؛ ۳) وازو ف ۱) خواستن؛ ۲) سرگرمی، بازی؛ ۳) به‌این زودی.

**وازیح:** وازح، ئاشکرا، خویا ف آشکار.

**وازیع:** وازح ف آشکار.

**وازیلین:** بەرهەمێکی نەوتە بۆ قەڵشی پێست دەرمانە ف وازلین.

**وازی‌وازی:** وازوازی ف وسواس در افکار خویش، دمدمی مزاج.

**واژ:** ۱) وارو، ئاوەژو، پێچـەوانـە؛ ۲) وەبـەران‌هاتـنـی مەڕ؛ ۳) گێژو سەرشێواو: (هاژو **واژ** بوم) ف ۱) وارونه؛ ۲) جفت‌خواهی میش؛ ۳) گیج، سراسیمه.

**واژاو:** ۱) پاشـاو، وازاو؛ ۲) ئاودانی شینـاوەرد پاش هەوەڵ‌ئاو ف ۱) پساب، نگا: وازاو؛ ۲) آبیاری مزرعه پس از نخستین آبیاری.

**واژو:** ۱) ناو بەقەباڵەو‌نان، مۆر، ئیمزا؛ ۲) پێویست، لازم، واجب ف ۱) مهر یا امضاء؛ ۲) واجب.

**واژوی:** داڕو، دەرمان‌حەمام، نوره ف واجبی.

**واژە:** ۱) گوتە، قسە، کەلیمە، لەبز، کوتە؛ ۲) دەنگی لك‌و گەڵا لەبەر با؛ ۳) گوندێکە لە کوردستان بەعسی کاولیان کرد ف ۱) واژه؛ ۲) صدای شاخ و برگ از وزش باد؛ ۳) نام دهی است درکـردستـان که بعثیان ویران کردند.

**واژی:** ۱) ئاوەژو؛ ۲) ئەوانیش ف ۱) وارونه؛ ۲) آنهاهم.

**واس:** ۱) خەبـــەر، باس: (هـەواسـە لەدیوانـان **چواسـە**؟)؛ ۲) خواز، پاشگری بەمانا داواکەر، واز ف ۱) بحث، خبر؛ ۲) پسوند به معنی خواهان.

**واسار:** بەهار، وەهار، یەکەم‌کژی‌ساڵ ف فصل بهار.

**واستش:** واز، ئارەزولێ‌بوُن ف آرزو یا اشتهای چیزی را داشتن.

**واستن:** خواستن، وازتن ف خواستن.

**واستە:** ۱) خواستن؛ ۲) خوازراو؛ ۳) دۆستی کارپێکهێنەر لای خەڵك ف ۱) خواستن؛ ۲) خواسته؛ ۳) پارتی.

**واستەن:** دڵخواز، وازلێ‌بون ف دلخواه.

**واستەنە:** دڵخوا، خواستەمەنی ف دلخواه.

**واسڵ:** گەیشتوی قەرزو دیاری ف واصل شده.

**واسواس:** گەلاپی، هەردەمە لەسەر وازێك ف دمدَمی.

**واســـە:** ۱) کەوابێ؛ ۲) بەڵێ وایە؛ ۳) پاس، ئێشــك؛ ۴) ئێژێ، وتی: (ئـەمیش **واسـە** گەرەکـمـە) ف ۱) اگر چنین باشـد؛ ۲) آری چنین است؛ ۳) پاس، نگهبانی؛ ۴) می‌گوید.

**واسەر:** ئەسپەك، نەخۆشیەکە ف بیماری سرسام.

**واسەگرتن:** ئێشك‌گرتن ف پاسداری.

**واسیتە:** ۱) سەبەب؛ ۲) واستە ف ۱) انگیزه؛ ۲) پارتی.

**واش:** ۱) بەم‌جۆرەیش؛ ۲) ئامـــاڵ: (ئـەم‌بۆزوە سپی‌**واشە**)؛ ۳) خوار، ناڵـەبار، دوای وشەی شاش دێ: (ئەم کورسی‌یە شاش‌و **واشە**)؛ ۴) پەرت‌و بڵاو: (بیرت شاش‌و **واشە**)؛ ۵) بەراز؛ ۶) خوەش، ساغ، وەش ف ۱) همینطور هم؛ ۲) فام، رنگِ مایل به؛ ۳) کج وناهموار؛ ۴) پرت و اشتباه کار؛ ۵) خوك؛ ۶) سالم و سرحال.

**واشتا:** گراوی، ماشقە، دۆستی مێوینە، دڵبەر ف معشوقە.

**واشتش:** دڵخواز، واز، ئیشتیا [ف] اشتها.

**واشته:** دەزگیرانی مێوینه [ف] نامزدِ مؤنث.

**واشتەنه:** وازلێبوُن، ئارەزوکردن [ف] آرزوکردن.

**واشـۆر:** جلکی ئاڵـوگۆڕ، جلکێ که بەخـاوێنی هەڵدەگیرێ [ف] جامۀ احتیاطی، لباس زاپاس.

**واشه:** ۱) باشو، باشوك؛ ۲) ئاوهاشه؛ ۳) چاکه، باشه؛ ۴) تفاقی ئاژەڵ [ف] ۱) باشه، پرندای شکاری؛ ۲) چنین هم هست؛ ۳) خوب است؛ ۴) علوفۀ حیوانات.

**واشەر:** ئاڵقەیەکی تەنکه دەخرێته بن پێچەوه بۆ توندبوُنی [ف] واشر.

**واشی:** ۱) ساقی، لەش ساغی؛ ۲) تۆ چاکی؛ ۳) بەمجۆرەیشی [ف] ۱) بهبودی؛ ۲) خوب هستی؛ ۳) اینطور هم هستی.

**واشێره:** بەری گیایەکه لەهەرزن دەکا، تۆمی گیای کارۆُش [ف] ثمر گیاهی است ارزن مانند.

**واعیز:** ئامۆژگاریدەر [ف] واعظ.

**واغ:** ناوی گوێز که بەمت دادەنرێ لەگەمەی گوێزێن دا، واخ [ف] نام گردو در گردوبازی.

**واغێن:** گوێزێن [ف] گردوبازی.

**واف:** بولبول، بڵبڵ [ف] بلبل.

**وافوُر:** ۱) تریاك، تلیاك، شیلەی خاشخاش؛ ۲) ئامرازی تلیاك کێشان، حۆقه [ف] ۱) تریاك؛ ۲) وافور.

**واق:** ۱) بیردان، جێگەی خەیاڵ: (**واقم ورما**، یانێ لەبیرکردنەوه کەوتم)؛ ۲) زیقەی کەروێشك و ڕێوی لەبەر ئازار؛ ۳) برێتی له زیقەی مناڵ؛ ۳) خاڵی [ف] ۱) اندیشەگاه، قوّۀ تفکّر؛ ۲) نالۀ خرگوش و روباه؛ ۳) کنایه از صدای خنده یا گریۀ طفل؛ ۴) خالی.

**واقاندن:** ناڵینی ڕێوی یان کەروێشك [ف] نالەوجیغ روباه و خرگوش از درد.

**واقانن:** واقاندن [ف] نگا: واقاندن.

**واقایش:** زیقاندن، قیژاندن، قیڕانن [ف] جیغ کشیدن.

**واق پەڕین:** بێهۆش بوُن لەترسان [ف] از ترس بیهوش شدن.

**واقوْ:** نەقەماسی، باقوْ [ف] نوعی ماهی.

**واق واق:** ۱) ناڵەناڵی ڕێوی و کەروێشك؛ ۲) ماسیگرەی سپی؛ ۳) ناوی جزیرەیەکـه لەچیرۆکـاندا که شتی عاجباتی لێبوه. قەدیم بەژاپۆن *گوتراوه* [ف] ۱) صدای نالۀ بیابی روباه و خرگوش؛ ۲) مرغ ماهیخوار سپیدرنگ؛ ۳) نام جزیرەای در داستانها، واق واق، کنایه از ژاپن.

**واق وڕ:** مات و گێژ [ف] مات و مبهوت.

**واق وڕبوُن:** گێژو مەنگ بوُن [ف] گیج و مُتحیّرشدن.

**واق وڕمان:** واق وڕبوُن [ف] متحیّرماندن.

**واق وڕماو:** گێژو مات داماو [ف] سراسیمه.

**واق وڕی:** گێژی و سەرگەردانی [ف] تحیّر، بُهت‌زدگی.

**واقوویق:** زاق و زیق، چەقەو هەرای زارۆکان [ف] جیغ و فریاد بچّەها.

**واقه:** دەنگی ناڵاندنی ڕێوی و کەروێشك [ف] صدای نالۀ روباه و خرگوش.

**واقەکەر:** برێتی له ماڵاتی ماڵی: (**واقەکەر** لەماڵما نیه) [ف] کنایه از احشام.

**واقـەواق:** ۱) دەنگی لەشوێن یەکی ناڵەی ڕێوی یان کەروێشك: (هەر واقـەواقی دڵمه بەدەستی فیراقەوه / وەك ڕێوی یه که هەردوگونی بێ بەفاقەوه) «شێخ ڕەزا»؛ ۲) برێتی له زیقەزیقی زارۆك [ف] ۱) نالۀ پیاپی روباه و خرگوش؛ ۲) کنایه از جیغ و فریاد شادی بچّه.

**واقی:** قیڕه، قیژه، زیقه [ف] جیغ.

**واقێ:** بەڕاستی: (لە**واقێ**دا وایه) [ف] واقعی، راستین.

**واقین:** ناڵاندنی ڕێوی و کەروێشك [ف] نالیدن روباه و خرگوش.

**واك:** ۱) ماسیگـره، واق واق؛ ۲) تشت، شتـەکـه، هین، هەرامه، وانێك، وشـەیەکه بۆ ئیشاره بەشتێك و زۆرجار بەزیاده دەگوترێ [ف] ۱) مرغ ماهیخوار سپید؛ ۲) چیز، آن چیز.

**واکـا:** ئاوها بکا: (خودا کارێکی **واکا** ئەوگەڵیەی پڕله کاکا پێی دەکرێ بڵان ناکا) [ف] چنین کند.

**واکات:** واکا [ف] چنین کند.

**واکاتن:** واکا [ف] چنین کند.

**واکرن:** ۱) باکردن، ئەستوُربوُن، پەنەمان، ئاوسان؛ ۲) کردنەوه، وازکردن [ف] ۱) بادکردن، آماسیدن؛ ۲) بازکردن.

**واکس:** بۆیاخ، بۆیاغ، ڕەنگی کەوشان [ف] واکس.

**واکسی:** کەسێ که کەوشان ڕەنگدەکاتەوه، بۆیەچی، بۆیاخچی [ف] واکسی.

**واکفت:** گەڕانەوەی نەخۆشی [ف] برگشت بیماری.

**واکلو:** براوخۆشکی بەقسەوهەر سەرزارەکی [ف] خواهر و برادر ظاهری.

**واکه:** ۱) ئاوها بکه؛ ۲) بکەرەوه، وازکه [ف] ۱) چنین کن؛ ۲) بازکن.

**واکەت:** واکفت [ف] برگشتن بیماری.

**واکەر:** ۱) وازکەر؛ ۲) شتێ که مرۆ بای پێ دەکا [ف] ۱) گشاینده؛ ۲) نفخ آور.

**واکینۆ:** ئەئاوها، ئابەمجۆره [ف] اینطور.

**واگژه:** گژەبا [ف] باد تند پاییزی.

**واگل:** گەڕانەوه [ف] بازگشت.

**واگۆ:** ۱) وازگۆ؛ ۲) ئاوای گوت؛ ۳) ئەوان گوتیان [ف] ۱) بازگو؛ ۲) چنین گفت؛ ۳) ایشان گفتند.

**واگۆن:** جێگەی خەڵك و بار له شەمەندەفەر [ف] واگن قطار.

**واگیر:** داگیر، بەزۆرسەندن [ف] غصب، تصرّفِ ناروا.

**وال:** واڵ، گوشادو پەل [ف] ظرف گشاد و کم عمق.

**واڵ:** ۱) پارچەی ڕەنگ پەمەیی تەنْك که تاراو جلکی بوُکی لێ دەکەن؛ ۲) پان و گوشادو پەل [ف] ۱) پارچۀ نازك صورتی رنگ؛ ۲) عریض و گشاد و کم عمق.

**والا:** ئاواڵه [ف] باز، مفتوح.

**والاّ:** ۱) ئاواڵـــه؛ ۲) بەتـاڵ و بێ ناوەرۆك؛ ۳) جلەبـوُکی کچـۆڵان؛ ۴) پارچـــەی تەنـــك و شاش [ف] ۱) باز؛ ۲) توخـالی، تهی؛ ۳) لبـاس عروسك؛ ۴) پارچۀ بسیار نازك، توری.

**والاَبیَژ:** ۱) دابیَژراو به پارچەی تەنك؛ ۲) پارچەی تەنکی شت پیَدابیَژان ف ۱) بیخته با پارچه؛ ۲) پارچۀ بیزن.

**والاَکردن:** راوه‌کردن ف شرح و تفسیرکردن.

**والاَمەن:** جۆریَ زیپکەی پیَست ف نوعی جوش پوست.

**والاَویَت:** والاَبیَژ، دابیَژراو به پارچەی شاش ف بیخته وسیلۀ نرمه بیز.

**واله:** بەخواقەسەم، سویَندبەخودا ف بەخدا قسم.

**والَه:** ۱) ئەسپاب: (وردەوالَه)؛ ۲) خوشك ف ۱) اسباب؛ ۲) خواهر.

**والَەرین:** سوَرەچنار، چناری جەوهەردار ف نوعی چنار.

**والَەکیَ:** خوشك ف خواهر.

**والی:** حاکمی ولاَت ف والی.

**والَیَ:** خوشك، والَه ف خواهر.

**والی‌نشین:** شاریَ که والی لیَدائەنیشیَ ف مرکز استان.

**وام:** ۱) ئەوەتام؛ ۲) بەبیری من: (**وام پیَباشه**)؛ ۳) قەرز: (مامه مامه دنیا دەستەوامه)؛ ۴) بەمجۆرەم: (**ئەمنیش هەروام**) ف ۱) اینك منم؛ ۲) بەنظرم؛ ۳) وام؛ ۴) چنینم.

**واما:** ئەوا مایەوه ف اینك ماند.

**وامار:** قەرزدار ف بدهکار.

**واماگ:** داماگ، داماو ف واله.

**وامدار:** قەرزار ف بدهکار.

**وامداری:** قەرزاری ف وامداری.

**وامن:** ۱) ئەوا من؛ ۲) ئەمانه قەرزن ف ۱) اینك من؛ ۲) وام هستند.

**وامه:** ۱) ئەوەتام؛ ۲) بەمجۆرەم؛ ۳) قەرزه ف ۱) اینجا هستم؛ ۲) چنینم؛ ۳) وام است.

**وامی:** بادام، باوی، باهیف ف بادام.

**وان:** ۱) پاشگری ئاگاداری: (**گاوان، باخەوان**)؛ ۲) پسپۆر: (**رازەوانی** چاکه)؛ ۳) کارکەر له شویَنیَ: (**دەشتەوان**)؛ ۴) شاریَکه له کوردستان؛ ۵) ئەمـان، ئەوان: (بوَ **وانه** هەرچی جوانەلە جیَ، دیَ، له ژن، له ماڵ /**هـەر عەرزه نیشتگـاهیمه، سنغـاته وەردو شیَـو**) «**سەیف**»؛۶) بەوجوَرەن، ئاوەهان ف ۱) بان، پسوند نگهداری؛ ۲) آگاه، متخصّص در کار؛ ۳) کارگر در جایی؛ ۴) شهری است در کردستان؛ ۵) اینها، آنها؛ ۶) چنانند.

**وانـا:** ۱) خویَندەوار، سیوات‌دار؛ ۲) خەتیَ که باش دەخویَندریَتەوه؛ ۳) ئەوان ف ۱) باسواد؛ ۲) خط خوانا؛ ۳) آنان.

**وانان:** ۱) ئەمان؛ ۲) ئەوان ف ۱) اینها؛ ۲) آنها.

**وانای:** ۱) فیَربوُنی خویَندن؛ ۲) خویَندن ف ۱) یادگرفتن درس؛ ۲) خواندن.

**وانج:** **میَژویَ، مژویَ**، نیسك ف عدس.

**واند:** خویَندی ف خواند.

**واندن:** خویَندن ف خواندن.

**وانکه:** پاشگری بەواتا: داپوَشـەر: (**بەروانکه، ملوانکه**) ف پسوند پوشش.

**وانگا:** ئەوسا ف وانگهی.

**وانه:** ۱) دەرز، دەرس، درز؛ ۲) پاشگری پاڵدان: (**دەستەوانه، لوُتەوانه**)؛ ۳) پاشگری بەواتا: ئەوانه: (**هەرچی دەیکەم بوَوانەیه**)؛ ۴) نەئاوها ف ۱) درس؛ ۲) پسوند اسنادی؛ ۳) پسوند به معنی اینها؛ ۴) نەچنین.

**وانەوان:** خویَندەوار، سیوات‌دار ف درس خوانده، باسواد.

**وانەیش:** وەخویَندن، خویَندنەوه ف مطالعه‌کردن.

**وانی:** ۱) ئاوها، بەمجۆره؛ ۲) سەربەولاَتی وان؛ ۳) توَ ئاوها نیت ف ۱) اینطور؛ ۲) اهل ولایت وان؛ ۳) چنین نیستی.

**وانیار:** خویَندەوار ف باسواد.

**وانیَك:** واك، تشت، شتەکەی ناوی نابەم ف چیز، آن شیء.

**وانیَها:** ئەمانەی لیَرەن ف اینها.

**واو:** ۱) قەرز، دەین، وام: (بـەدەستـەواو بمـدەیه)؛ ۲) ناوی پیتیَکی ئەلف‌وبیَتکه ف ۱) وام؛ ۲) نام حرفی در الفبا.

**واوا:** ۱) برین‌و برینـداری لەزمـانی منـالاَندا: (چەچم **واوا** بوه)؛ ۲) ئەمجۆرەو ئەوجـوَره، جویَنیَکـه: (**واوالیَ‌کراوی واواپیَکـراو**) ف ۱) زخم در زبان کودکانه؛ ۲) چنین و چنان، دشنامی است.

**واوان:** ناوی گوندیَکه له کوردستان ف نام روستایی است در کردستان.

**واوش:** بن‌کەوش، بن‌هەنگڵ ف زیر بغل.

**واووه:** کریَوەو بوَران ف برف و بوران.

**واوه:** ۱) بوَ ئەملایه: (**واوه وەره**)؛ ۲) بوَ ئەولا: (**واوه برِوَ**) ف ۱) به این سو؛ ۲) بەآن سو.

**واوەش:** ئامیَز، باوەش ف آغوش.

**واوی:** دیسان، سەرلەنویَ ف ایضاً، از نو.

**واوی‌دوی‌عەمر:** بریَتی له کەسیَ که هەمیشه بەدوای کەسیَکەوەیه ف کنایه از کسی که همواره به دنبال دیگری باشد.

**واویَژ:** ۱) وازگوَ؛ ۲) پەرسف، جواب، وەرام ف ۱) بازگو؛ ۲) پاسخ.

**واویَك:** ۱) مەلیَکه لەدەم ئاوان دەژی؛ ۲) چەقەڵ، توَرِی ف ۱) پرنده‌ای است؛ ۲) شغال.

**واها:** ئاوەها، بەمجوَره ف اینطور.

**واهار:** سەرپەرشت، گەورەی ماڵ ف سرپرست خانواده.

**واهر:** واهار، سەرپەرشتی ماڵو خیَزان ف سرپرست خانواده.

**واهش:** کیَوی، لاور، وەحشی ف وحشی.

**واهشی:** واهش ف وحشی.

**واهوُر:** باهوَز، گیَژەلوُکەو توَف ف گردباد و طوفان.

**واهه:** ئائەمه ف همین.

**واهەر:** خوشك ف خواهر.

**واهەم:** دەگەڵ‌یەك ف باهم.

**واهیمه:** ترس، خوَف ف هراس.

**وای:** ۱) رای‌کرد؛ ۲) وشەی داد له ژان: (**وای مردم**)؛ ۳) توَ ئەوجوَرەی؛ ۴) گوم‌و نەدیار نیت: (**وای لیَره**) ف ۱) فرارکرد، دوید؛ ۲) حرف فغان از درد، وای؛ ۳) چنانی؛ ۴) پیدلیی، اینك هستی.

**وایته:** ۱) ئەوەتای؛ ۲) ئاوەهای، ئەوجوَرەی ف ۱) اینك تویی؛ ۲) چنانی.

**وایچه:** بەوجۆرەش [ف] چنین نیز.
**وایر:** خاوەن، خودان، وایەر [ف] صاحب.
**وایرەی:** داژداری، بەخاوەن بوُن [ف] صاحب شدن.
**وایری:** داژداری [ف] صاحب شدن.
**وایش:** ۱) ئۆف، ئاخ؛ ۲) وایچه [ف] ۱) آخ؛ ۲) چنین نیز.
**وایشه:** وایچه [ف] چنین نیز.
**وایکه:** خوشك، خوار، خوەیشك [ف] خواهر.
**وای‌لمن:** داخو دەرد بۆمن [ف] وای برمن.
**وایلیٚ:** هەی دادو هاوار [ف] ای وای.
**واین:** ۱) هەلاٚتن، راکردن؛ ۲) ئاوەهاین ئێمه [ف] ۱) فرارکردن، دویدن؛ ۲) چنانیم.
**واینه:** ئاوەهاین [ف] چنانیم.
**وایه:** ۱) راستە، درۆنیە؛ ۲) بەوتەرزەیە؛ ۳) وەعدە؛ ۴) گوندێکە لە کوردستان بەعسی ویٚرانی کرد؛ ۵) خۆشك، خوار، وایکه [ف] ۱) اینطور است. صحیح است؛ ۲) چنان است؛ ۳) هنگام؛ ۴) از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان؛ ۵) خواهر.
**وایەر:** خاوەن، خێو، خودان [ف] صاحب.
**وایەرەر:** بەخاوەن بوُن [ف] صاحب شدن.
**وایەی:** خوشکایەتی، دەستەخۆشکایەتی [ف] خواهری.
**وایی:** رای کرد، هەلاٚت [ف] فرارکرد.
**وت:** ۱) گوتی، کوتی، وتی؛ ۲) خەوت؛ ۳) شێ، نم، تەڕایی؛ ۴) نوُزە، کەمترین دەنگ؛ ۵) دلۆپە؛ ۶) فڕ، قوم [ف] ۱) گفت؛ ۲) خوابید؛ ۳) نَم؛ ۴) ناله؛ ۵) قطره؛ ۶) جُرعه.
**وتا:** مرۆی مێوینەی خەفتگ [ف] خوابیده (مؤنث).
**وتاخ:** ئۆدە، ژوُری دانیشتن [ف] اتاق.
**وتار:** ۱) نوسراوی درێژ لەسەر مەبەستێ؛ ۲) قسە بۆخەڵك کردن دەربارەی مەبەستێ [ف] ۱) مقاله؛ ۲) سخنرانی، گفتار.
**وتاربێژ:** کەسێ قسە بۆ خەڵك دەکا لەسەر بەرزەکەوە [ف] سخنران.
**وتارنوُس:** کەسێ کە دەربارەی شتێکەوە بەدرێژی دەنوُسێ [ف] مقاله‌نویس.
**وترە:** سەرفترە [ف] زکات فطر.
**وتش:** خەوتن، نقستن، نوستن [ف] خوابیدن.
**وتم:** گوتم [ف] گفتم.
**وتن:** ۱) گوتن؛ ۲) گوتیان [ف] ۱) گفتن؛ ۲) گفتند.
**وتو:** ئوتو، ئاسنی گەرم بۆ گنج‌لابردنی جلکی چرچ [ف] اطو.
**وتۆ:** ۱) بەم‌جۆرە؛ ۲) گوتت [ف] ۱) اینطور؛ ۲) گفتی.
**وتوُ:** وتاردان، قسە بۆخەڵك کردن [ف] سخنرانی کردن.
**وتۆت:** پرتەپرت، بەپچڕپچڕو بۆڵە قسەکردن [ف] غرولندکردن.
**وتوُز:** گلار، خلۆر، ئوتوس: (بەردەکە لەچیاوە وتوُز بو) [ف] غلتان.
**وتوُزبوُن:** گلارەوبوُن [ف] غلتیدن از بالا به پایین.
**وتوُزکردنەوە:** خلۆرکردنەوە [ف] غلتانیدن از بالا به پایین.
**وتوُکردن:** چرچ لابردن بەوتوُ [ف] اطوکشیدن.

**وتوُکێشان:** وتوُکردن [ف] اطوکشیدن.
**وتوویر:** واتۆ، قسەی ناوخەڵك [ف] شایعات.
**وتوویرە:** نێوان خەوتن‌و بەخەبەری، بیرەخەو [ف] بین خواب و بیداری.
**وتوویژ:** گفتوگۆ، قسەکردن دەگەڵ یەکتر [ف] گفتگو.
**وتە:** ۱) قسە، گوتە؛ ۲) واتۆ؛ ۳) خەو؛ ۴) قوتە، زرنگ؛ ۵) کەمترین دەنگ، وستە، خوست [ف] ۱) گفته؛ ۲) شایعه؛ ۳) خواب؛ ۴) زرنگ؛ ۵) نالهٔ خفیف.
**وتەڵە:** قوتەکە، زرنگی چکۆلە [ف] کوچولوی زرنگ وباهوش.
**وتەن:** خەوتوە، نوستوە، خەفتگە، رازایە، نقستی‌یە [ف] خوابیده است.
**وتەنی:** واتەنی [ف] نگا: واتەنی.
**وتەوان:** قسیەکەر، بێژەر [ف] سخنگو.
**وتەوت:** ۱) قسەی ناوخەڵك، ئیشاعە؛ ۲) پستەپست، پچەپچ، چپەچپ [ف] ۱) شایعه؛ ۲) پچ‌پچ.
**وتی:** ۱) گۆ، گوتی، گۆت، پەیفی؛ ۲) وتوُ، ئوتوُ [ف] ۱) گفت؛ ۲) اطو.
**وجا:** ۱) ئەوێ، ئەیٚنە؛ ۲) لەوێ، لەیٚنە [ف] ۱) آنجا؛ ۲) درآنجا.
**وجاخ:** ۱) تفْك، ئاگردان، کوچك‌ئاگر؛ ۲) خانەدانی بەمیوان؛ ۳) نەجیم، مرۆی رەسەن [ف] ۱) آتشدان؛ ۲) خاندان مهماندوست؛ ۳) نجیب.
**وجاخدار:** میوانگر، ماڵی بەمیوان [ف] مهمان‌پذیر، سخی.
**وجاخ‌روُن:** ۱) مێوان‌ڕاگر، نان‌بدە؛ ۲) خاوەن عەولادی باش [ف] ۱) مهمان‌پذیر؛ ۲) دارای فرزندان خوب.
**وجاخ‌زادە:** ۱) باوەلێ، سەهید؛ ۲) بەچکەشێخ [ف] ۱) سیّد؛ ۲) اولاد اولیاء.
**وجاخ کوێر:** بێ‌فرزەندی نێرینە [ف] فاقد فرزند مُذکّر.
**وجاراپەی:** ۱) لەوێ‌بەولاوە؛ ۲) لەپاش ئەوە [ف] ۱) از آن ببعد؛ ۲) پس از آن.
**وجارای:** گێڕانەوەی خەون [ف] بازگویی خواب و رؤیا.
**وجاغ:** وجاخ بەهەمو بارانیدا [ف] نگا: وجاخ و مشتقّات آن.
**وجدان:** هەستی دڵ‌و دەروُن [ف] وجدان.
**وچ:** دانەوێڵەو ئەرزاقی ناوماڵ [ف] حبوب و موادّ خوراکی درخانه.
**وچان:** ۱) پشوُدان، ئیسراحەت؛ ۲) مۆڵەت: (وچانم بدە تا پایز قەرزەکەت دەدەمەوە) [ف] ۱) استراحت؛ ۲) مهلت.
**وچاندان:** ۱) پشوُدان، ئیسراحەت کردن؛ ۲) مۆڵەت‌دان، مەودادان [ف] ۱) توقّف کردن برای استراحت؛ ۲) مهلت دادن.
**وچان گرتن:** پشوُدان، وێستانێ کەم [ف] توقّف اندك.
**وچخانە:** خەڵوەتی، ژوُری ئەرزاق‌و کەل‌پەلی پێداویستی ماڵ، پاشخان [ف] پَستو.
**وچك:** ۱) لە بزگورو تیتاڵ گوریس چێ‌کرن؛ ۲) نوُك، نوُکی قەڵەم‌و تەشی‌و... [ف] ۱) ساختن طناب از رشته‌های مختلف؛ ۲) نُك هرچیز تیز.
**وچۆچ:** جریوەجریوی مەلی بوُچْك [ف] جیك جیك پرندگان کوچك.
**وْدم:** ۱) ممبارەکی، پیرۆزی: (خوێ‌ڕشتن وْدمی باش نیە)؛ ۲) ئیجازەی شێخ بۆ کەسێ کە تف‌و فوُی دەرمان بێ‌و ماربگرێ: (دەروێش قوتاس

وْدمی پیّ‌یه) ف ۱) شگون، یُمن؛ ۲) اجازهٔ مخصوص از پیر طریقت به مرید.

**وْدمانه:** حه‌ق‌ده‌می خاوه‌ن‌وْدم ف پاداش نفس پاکی.

**وْدمدار:** خاوه‌ن‌وْدم ف شخص نفس پاك مجاز از پیر.

**وْدوْده:** شتێك که زۆر بزۆزه‌و هه‌داناداف عجول ناآرام.

**ودیله‌ك:** وردیله، زۆرپچوُك ف بسیار ریز.

**ور:** ۱) ئێره، ئه‌م‌شوێنه؛ ۲) گڕی ئاگر، گڕی ئاور؛ ۳) بڕ، بڕنده: (بیور، بوْر)؛ ۴) پێچه‌وانه‌ی درشت، له‌تی زۆر پچوك: (ورکه‌نان، ورکه‌به‌رد)؛ ۵) به‌ره‌وسه‌رو، هه‌ڵ؛ ۶) خاوه‌ن: (په‌له‌ور) ف ۱) اینجا؛ ۲) زبانهٔ آتش؛ ۳) برنده، کسی یا چیزی که قطع می‌کند؛ ۴) خُرد، ریز؛ ۵) روبه‌بالا؛ ۶) پسوند به معنی صاحب، دارنده.

**وڕ:** ۱) شڕ، دڕاو: (کراسه‌که‌م شڕ و وڕ بوه)؛ ۲) دروْ، قڕ؛ ۳) گیژ، سه‌رسام؛ ۴) خوْر، ئه‌وی ده‌خوا: (کاوڕ به‌مانا کاخوْر)؛ ۵) بڕ، ئه‌وی ده‌بڕی: (دیواروڕ، داروڕ)؛ ۶) قسه‌ی زۆرو بێ‌تام (چه‌نێ وڕ لێ ئه‌ده‌ی) ف ۱) لت وپاره؛ ۲) دروغ؛ ۳) گیج و سرسام؛ ۴) خورنده؛ ۵) بُرّنده، کسی یا چیزی که می‌برّد؛ ۶) سخنان زیاد و بی‌مزه، ور.

**وُڕ:** خروی له‌ش، خارشت ف خارش بدن.

**ورا:** ۱) بێره‌دا، لێره‌وه، له‌گره؛ ۲) کاول، تێك‌وپێك‌چوُگ؛ ۳) برا: (کاورا) ف ۱) از اینجا؛ ۲) ویران، خراب؛ ۳) برادر.

**وڕا:** وته‌یه‌که به‌کۆمه‌ڵ ده‌یڵێن بۆ خۆشی‌ده‌ربڕین به‌رانبه‌ر به‌که‌سێ وه‌ك وته‌ی بژی ف هورا.

**ورار:** زراو، قووه‌تی دڵ، ئازایی دڵو ده‌روُن ف زهره، شجاعت.

**وراز:** ۱) وارز، دورمان، درومان؛ ۲) به‌راز: (بچیم ڕاوه‌وراز که‌یم) ف ۱) دوخت؛ ۲) گُراز، خوك‌وحشی.

**ورازنای:** ۱) راسته‌وه‌کردن؛ ۲) له‌خه‌وڕاکردن ف ۱) راست و عمودگردانیدن؛ ۲) بیدارکردن.

**ورازین:** دروُن، ته‌قه‌ڵ‌لێدان ف دوختن.

**وراست:** وراز، وارز ف دوخت و دوز.

**وراستن:** ورازین ف دوختن.

**وراسته‌ی:** درومان ف خیّاطی.

**وراق:** رفان، فڕان ف رُبودن.

**وڕاق:** گوشاد، بۆ جلك‌و تێرو جه‌واڵ ده‌گوترێ: (جه‌واڵێکی وڕاقه، که‌وایه‌کی زل‌و وڕاقه) ف گشاده، گشاد.

**وراقنه:** رفاندن ف ربودن.

**وراق‌وراق:** فڕان‌فڕان، رفان‌ڕفان ف قاپیدن از دست یکدیگر.

**وڕاوه:** راوه، راواندن، قسه‌ی بێهۆشانه ف هذیان.

**وڕاوه کردن:** راواندن: (به‌خوا زۆر نه‌خۆشه وڕاوه‌ئه‌کا) ف هذیان گفتن.

**وڕای:** رمیان ف ویران شدن، فروریختن.

**وڕایش:** ۱) خوران، خارشت؛ ۲) خوراندن ف ۱) خاریدن؛ ۲) خاراندن.

**وڕبێژ:** درۆزن ف دروغگو.

**وڕپڕای:** ره‌خس، سه‌ما ف رقص، پایکوبی.

**ورت:** ۱) ور، پێچه‌وانه‌ی درشت: (ورتکه‌به‌رد، ورتکه‌نان)؛ ۲) پرته، قسه‌ی له‌ژێرلێوانه‌وه ف ۱) خُرد؛ ۲) لند، حرف زیر لبی.

**ورتاندن:** ۱) پرته‌کردن؛ ۲) چڵك‌دانی برین: (ده‌می برینه‌که‌م ده‌ورتێنێ) ف ۱) لندیدن؛ ۲) تیرکشیدن زخم.

**ورتکه:** ۱) زۆر ورد: (منداڵه‌ورتکه)؛ ۲) به‌ندی ئێسکان: (ورتکه‌م‌له‌جێ‌چوه) ف ۱) خُرده‌ریزه؛ ۲) بند انگشت.

**ورته:** پرته، قسه‌ی له‌ژێرلێوانه‌وه، ورت ف لند.

**ورته‌ورت:** ۱) ورته‌ی زۆر؛ ۲) له‌بۆڵاندن‌و پرته به‌س که: (ده‌ڵێم به‌سیه‌تی ورته‌ورت) ف ۱) لندیدن زیاد؛ ۲) فرمان به خاموشی از غرولند.

**ورچ:** حورچ، حش، خرس، حه‌ش ف خرس.

**ورچنیا:** بژارده، هه‌ڵبژارده ف برگزیده.

**ورچه:** ۱) زه‌لامی تێك‌سمڕاو؛ ۲) ناوه‌بۆ سه‌گان ف ۱) گندهٔ قوی هیکل؛ ۲) نام سگانه.

**ورچه‌قوڵه:** برێتی له بنیاده‌می قه‌ڵه‌وی کورته‌بالا ف کنایه از آدم تُپُل.

**ورچه‌ك:** گوندێکه له کوردستان به‌عسی وێرانی کردن ف نام دهی است در کردستان که بعثیان ویران کردند.

**ورچه کوڵه:** برێتی له بنیاده‌می قه‌ڵه‌وی کورته‌بالا، ورچه‌قوڵه ف کنایه از آدم چاق کوتاه‌قد، تپُل.

**ورچه کوْڵه:** به‌چکه‌ورچ ف بچه‌خرس.

**ورخال:** خه‌رتل، داڵ، داڵاشی‌سورباو ف لاشخور.

**ورد:** ۱) ور، ورت، پێچه‌وانه‌ی درشت؛ ۲) برێتی له بنیاده‌می زرنگ‌و ته‌کوُز: (پیاوێکی ورده له کاری خۆی‌دا)؛ ۳) تماشاکه، سه‌رنج‌بده: (ورد ئه‌مه چه‌ئه‌کا)؛ ۴) دوعای ژێرلێوان ف ۱) خُرد، ریز؛ ۲) کنایه از آدم منظّم و باهوش؛ ۳) نگاه کن، دقّت کن، بنگر؛ ۴) وِرد.

**وردا:** بێره‌دا، لێره‌وه ف از اینجا.

**وردبوُن:** له‌ت‌وپه‌ت‌بوُن، بوُنه‌تۆز وه‌ك ئارد ف خردوریزشدن.

**وردبوُنه‌وه:** ۱) به‌زیتی له‌شتێ ڕوانین؛ ۲) بیرکردنه‌وه؛ ۳) گۆڕانه‌وه‌ی پوُڵ به‌پوُڵ؛ ۴) فرۆشرانی ماڵی بازرگانی ف ۱) با دقّت نگاه کردن؛ ۲) فکر کردن؛ ۳) خردشدن پول؛ ۴) فروخته‌شدن کالای بازرگانی.

**وردبین:** بیرتیژو به‌هۆش ف هوشیار و نازك‌بین.

**وردکردن:** ۱) کردنه‌تۆز، له‌ت‌وپه‌ت‌کردن؛ ۲) پوُڵی زل به‌پوُڵی پچوُك گۆڕینه‌وه ف ۱) خُرد کردن؛ ۲) پول خُرد کردن.

**وردکردنه‌وه:** گۆڕینه‌وه‌ی پوُڵی زل به پچوُك ف خُرد کردن پول.

**وردکه:** ۱) ورتکه؛ ۲) له‌ت‌وپه‌ت بکه ف ۱) خُرده، ریزه؛ ۲) خُردکن.

**وردمرد:** شڕوشاتاڵ، خرتوپرت ف خِرت و پرت.

**ورداڵه:** خرت‌وپرت، که‌ل‌په‌لی که‌م‌نرخ ف خرت و پرت.

**وردوبوُن:** وردبوُنه‌وه ف دقّت کردن.

**وردوخاش:** زۆرورد ف خردوخاك، بسیار ریز.

**وردوخاڵ:** وردوخاش ف بسیار ریز.

**وردوخان:** وردوخاش ف بسیار ریز.

**وردودرشت:** ۱) بچوُك‌و زل؛ ۲) برێتی له گش خێزانی ماڵ یان ئاوایی

ف ۱) ریز و درشت؛ ۲) کنایه از همهٔ افرادخانواده یا آبادی.

**وردورد:** ۱) زۆرورد: (**وردوردی** کرد)؛ ۲) بەسەپایی لێ ڕوانین: (**وردورد** تیی ڕوانی) ف ۱) بسیار ریز؛ ۲) با دقّت نگاه کردن.

**وردە:** ۱) وردا، بیرەدا؛ ۲) بریتی لە بزن و مەڕ: (وردەم چەندسەرێك هەیە)؛ ۳) خرت‌وپرت؛ ۴) کەمێ، کەم؛ ۵) کەمرەو تەپاڵەی ورد کە لە پەین درشت‌تر بێ بۆ سوتاندن ف ۱) از اینجا؛ ۲) کنایه از بز و گوسفند؛ ۳) خرت‌وپرت؛ ۴) اندکی؛ ۵) تاپالهٔ ریز.

**وردەئاهەنگ:** ۱) دەنگی بڕبڕەو پس‌پس؛ ۲) بریتی لە تڕ، بای بەدەنگی پشتەوە: (پیر کە کۆکیی و نەتڕی دوورە لەمردن هێشتا/ وردەئاهەنگی دوای کۆکە نیشانەی ئەجەلە) «شێخ‌ڕەزا» ف ۱) صدای بریده بریده؛ ۲) کنایه از گوز.

**وردەبا:** بریتی لە تڕ و تس ف کنایه از باد مقعد.

**وردەبابەت:** کەل‌پەلی چەرچی، وردەواڵە ف کالا و مناع پیلەور.

**وردەباز:** گاڤی لهەڤ‌نزیك ف گامهای کوچك و بەهم نزدیك.

**وردەبزە:** زەردەخەنەی کەم ف لبخند سبك، تَبَسُّم.

**وردەبەز:** پارچەبەزی ناوزگ ف خردەپیەدرون شکم.

**وردەبین:** وردبین ف باریك‌بین، نازك‌بین.

**وردەتەریب:** تەقەڵی وردو لێك‌نزیك ف بخیەهای ریز و متّصل در دوخت.

**وردەدان:** دانەوێڵەی جگە لەگەنم و جۆ ف بنشن.

**وردەدەمار:** ڕەگی زۆر باریك لەئەندامدا ف زردپی.

**وردەڕەگ:** ۱) وردەدەمار؛ ۲) ڕەگی وردی دەرەوەی شاڕەگی ڕوەك ف ۱) زردپی؛ ۲) پرزهای پیرامون ریشهٔ نباتات.

**وردەشەڕ:** نیوەشەڕ ف نگا: نیوەشەڕ.

**وردەفرۆش:** ۱) پێچەوانەی کۆفرۆش، کەسێ کە یەکەیەکە شت دەفرۆشێ لەدوکاندا؛ ۲) بریتی لە دوکانداری فەقیر؛ ۳) چەرچی ف ۱) تك‌فروش، خردەفروش؛ ۲) کنایه از کاسب کم‌سرمایه، خردەپا؛ ۳) پیلەور.

**وردەقەن:** خاکەقەند ف خاکەقند.

**وردەقەند:** خاکەقەند ف خاکەقند.

**وردەك:** پاژێ لە شێست‌پاژی سەحات، دەقیقە ف دقیقهٔ ساعت.

**وردەکار:** ۱) بنیادەمی ڕێك‌وپێك و زانا؛ ۲) دەس‌ڕەنگین؛ ۳) کاروباری بڵاو، جۆربەجۆری کار ف ۱) آدم مرتّب و منظّم؛ ۲) هنرمند؛ ۳) کار متفرّقه.

**وردەکاری:** ۱) دەس‌ڕەنگینی؛ ۲) بیرکردنەوەو باش پێك‌هێنان ف ۱) هنرمندی؛ ۲) نظم و ترتیب.

**وردەکوت:** ۱) چەند پارچەی چکۆڵە؛ ۲) دوامین گێرەی خۆیان ف ۱) قطعات ریز؛ ۲) آخرین مرحلهٔ خرمن‌کوبی.

**وردەگر:** ئیرادگر، ڕەخنەگر ف خردەگیر.

**وردەگلەیی:** گلەیی دۆستانە ف گلهٔ دوستانە.

**وردەڵ:** گردەڵ، کورتەبالای خڕکەڵە ف کوتاەقد چاق، تُپُل.

**وردەلە:** ۱) زۆر چکۆڵە؛ ۲) جومگە ف ۱) ریز؛ ۲) مچ.

**وردەماڵ:** ئاژەڵ، مەڕو بزن ف کنایه از گوسفند وبز.

**وردەمردە:** خرت‌وپرت، شڕوشاتاڵ ف خرت و پرت اثاثیه.

**وردەو:** تواشاکە، سەرنج‌بدە ف نگاه کن، توجّه کن.

**وردەواڵە:** ماڵی چەرچی ف کالای پیلەور.

**وردەوردە:** کەم‌کەمە، سەبرەسەبرە ف کم‌کم، یواش‌یواش.

**وردەوبوون:** ۱) وردبوونەوە؛ ۲) وردبوونەوەی پوولی زل بە بچوك؛ ۳) فرۆشرانی ماڵ ف ۱) دقّت کردن؛ ۲) خردشدن پول؛ ۳) فروختەشدن کالا.

**وردەویەخسیر:** بریتی لە گش‌بەگشتی بنیادەم و دارایی و زیندەوەر لەئاوایی‌دا: (هاتنەسەرمان **وردەویەخسیریان** بردین) ف کنایه از عموم اهالی و اموال.

**وردی:** ۱) پچوکی، گچکەیی؛ ۲) باش‌بیرکردنەوە ف ۱) خردی و ریزی؛ ۲) دقّت.

**وردیان:** زیندانەوان ف زندانبان.

**وردیس:** چەموڵە بە هەردودەست، پوکاوڵە بە دودەست ف با دو دست ام کردن.

**وردێك:** وردیلە، زۆر ورد ف بسیار ریز.

**وردیك‌بیایش:** گچکە بۆتەوە ف کوچك شده است.

**وردیك‌دیایش:** بچوك دیاردەکا ف کوچك می‌نماید.

**وردی‌کلا:** چکۆلۆکە ف کوچولو.

**وردی‌کلانە:** وردی کلا: (بالام کردەوە مەیل وەلای پەستی/ وردیکلانەن دەروازەی هەستی) «مەولەوی» ف کوچولو.

**وردێکەك:** وردکۆکە ف کوچولو.

**وردێکەی:** گچکەیی ف کوچکی.

**وردیلانە:** چکۆلانە ف کوچولوی دوست داشتنی.

**وردیلە:** وردی زۆرورد ف بسیار ریز.

**وردیلەك:** وردی زۆرورد ف بسیار ریز.

**وردیلەکە:** زۆر چکۆلانە ف بسیار کوچولو.

**وردی‌مرد:** شروتاڵ، خرت‌وپرت ف خِرت وپِرت.

**وردی‌مردی:** وردی‌مرد ف خِرت وپِرت.

**وردینە:** هەردوك، هەرتك ف هردو.

**وردینی:** هەردوکیان، هەرکیان، هەردینان ف هردوشان.

**وررۆ:** هەموڕۆژێ، گڕۆژێ ف هر روز.

**وررۆنێن:** هەرڕۆژێك، هەرکاتێك لە وەخت ف هرگاه.

**وررە:** ۱) پەموی تازە بەهەللاجی کراو: (لەشی دەڵێی وررەی لۆکەیە)؛ ۲) دەنگی ڤرڕە، دەنگی سوڕانی بەپەلەی چەرخ یان شتی ناوخاڵی ف ۱) بهترین قسمت پنبه از غوزه؛ ۲) صدای چرخش شتابان چرخ یا جسم توخالی.

**ورژ:** برژ ف برشت.

**ورژان:** برژان ف برشتەشدن.

**ورژاندن:** براژتن، برژاندن ف برشتن.

**ورژانن:** ورژاندن ف برشتن.

**ورشە:** گرشە، بریقە ف درخشش.

**ورشەدار:** گرشەدار، بریقەدار ف درخشندە.

**ورشەدان:** بریقان ف درخشیدن.

**ورشەك:** جۆرێ پشیلەکێوی کە کەوڵی نەرم و زۆر بەنرخە، وشەك، وشەگ ف نوعی گربەسان وحشی کە پوستش قیمتی است.

**وڕك:** گڕو، پەڵپ ف بهانهٔ کودك.

**وڕکاوی:** بەڵپگر، گڕوگر ف بهانەگیر.

**وڕکدار:** وڕکاوی ف بهانەگیر.

**وڕك گرتن:** گڕوگرتن، پەڵپگرتن ف بهانەگرفتن.

**ورکە:** ١) ورتکە؛ ٢) نکە، دەنگی کەمی گریاناوی: (هەر **ورکەی** دێت، ورکــەی ببــڕە)؛ ٣) خەمو خەیاڵاتی دڵ، کورکــە؛ ٤) جمگــەی وڵاخــبــەرزە: (لــە**ورکە** چوە) ف ١) خردە؛ ٢) نك ونال؛ ٣) غم و هوسهای دل؛ ٤) مُچ ستور.

**وڕکە:** بەرەوژوور بازبردن، هەڵبەزین ف جست‌وخیز، پرش.

**ورکەمی:** هەرکێ، هەرکەس ف هرکس.

**ورکەنە:** سەری چەسپاو بەشتێکەوە لاگرتن، هەڵکەندن ف برکندن.

**وڕکەنە:** ١) پێکردنی ئاگر؛ ٢) پێهەڵچوُن ف ١) افروختن آتش؛ ٢) بالارفتن از سنگ و دیوار.

**وڕکەوڕکە:** فڕکەفڕك، فڕكوهوڕ، هەڵبەزدابەز ف جست‌وخیز.

**ورگ:** عوُر، حورگ، عورگ، کرش، گەدە، مەدە ف شکمبە.

**وڕگ:** پەڵپ، گڕو ف بهانهٔ بچە.

**ورگدان:** سنگدانی دیوار ف انحنای دیوار.

**ورگدڕاو:** زگ‌دڕاو، بریتی لە زۆرخۆر ف کنایە از پُرخور.

**ورگڕنای:** وڕکەنە، پێکردنی ئاگر، داگیرساندنی ئاور ف برافروختن آتش.

**ورگن:** زگ‌زل ف شکم گندە.

**ورگنە:** ورگن ف شکم‌گندە.

**ورگە:** ١) ورگن؛ ٢) جێ‌خواردەمەنی ف ١) شکم گندە؛ ٢) معدە.

**ورگ‌هاتن:** ورگ‌ئەستوُربوُن. *بۆ ژنی زگ‌پڕی دەڵێن* : (**ورگی هاتوە** دیارە زگی پڕە) ف شکم برآمدن. *برای زن حاملە گویند* .

**ورگێل:** ١) زڤڕ، چەرخ؛ ٢) ژێروژوو ف ١) برگشت؛ ٢) زیرورو.

**ورگێلان:** ١) زڤڕین، گەڕانەوە؛ ٢) ژێروژوبوُن ف ١) برگشتن؛ ٢) زیروروشدن.

**ورگێلانن:** ١) زڤڕاندن، چەرخاندن؛ ٢) ژێروژوکردن ف ١) برگرداندن؛ ٢) زیرورو کردن.

**وڕلێدان:** قسەی زۆرو بێتام کردن ف وراجی.

**ورم:** ١) روُخان، رمان؛ ٢) قوم، فڕ ف ١) ریزش دیوار؛ ٢) جُرعە.

**ورماشەنە:** خواردنەوەی بێڕاوەستان ف لاجُرعە سرکشیدن.

**ورمان:** روُخان، رمان ف فروریختن.

**ورمــای:** ١) روُخــاو، رمــاو؛ ٢) قوپــانی زەوی ف ١) فروریختــە؛ ٢) فرورفتگی زمین.

**ورمــزیار:** گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**ورمێ:** ١) ودم؛ ٢) شارێکە لە کوردستان ف ١) یمن، شگون؛ ٢) اُرومیّە.

**ورمێدار:** ئیجازەپێدراو لەلایەن شێخەوە، ودمدار ف مجاز از پیر طریقت.

**ورنایش:** ١) خارش، خورو؛ ٢) خوراندن بە نینۆك ف ١) خارش؛ ٢) خاراندن با ناخُن.

**ورنگ:** ١) گۆرانی‌وتنی بەسەبر بێ دەم‌کردنەوە؛ ٢) پشو، وچان ف ١) زمزمهٔ زیرلبی؛ ٢) وقفە برای استراحت.

**ورنگدان:** پشودان، وچان‌گرتن ف توقّف کوتاە برای استراحت.

**ورنگ گرتن:** پشودان، ورنگدان ف توقّف کوتاە برای استراحت.

**ورنگە:** گۆرانی سەبری بێ‌دەم‌کردنەوە، ورنگ ف زمزمهٔ زیرلبی.

**ورنگەورنگ:** ورنگەی زۆر ف زمزمهٔ پیاپی زیرلبی.

**وڕۆ:** ١) پیاگی خوێڕی‌و بێکــارە؛ ٢) بۆگەن‌بوُگ ف ١) مرد بیکارە؛ ٢) بوی گندزدە.

**ورورە:** گەرای خای ناوزگی مامــر، گەرای ناوزگی مریشــك کە هێشتا نەبۆتە هێلکە ف اشپیل تخم‌مرغ، پورهٔ تخم‌مرغ.

**وڕوڕە:** ١) چەقەو چەنەدرێژی بێ‌تام؛ ٢) لەیستۆکێکی زارۆکانە لە قالۆر دەیکەن‌و ڤرەڤری دێ، ڤرڕە؛ ٣) بریتی لە ژنی چەنەبازی فێڵاوی ف ١) وراجی، ژاژخــایی؛ ٢) نوعی اسباب بازی کە از ساقهٔ میان تهی سازند و می‌چرخانند صدا می‌دهد؛ ٣) کنایە از زن مکّار وراج.

**وڕوڕەی جادو:** ١) ناوێکی خەیاڵی‌یە لەچیرۆکاندا بۆ ژنی سیحر باز؛ ٢) بریتی لە پیرێژنی بەفــرت‌وفێڵ ف ١) نامی افســانــەای؛ ٢) کنایە از پیرزن مکّار.

**وروژ:** شڵەژانی بەکۆمەڵ، توُڕەبوُنی بەکۆ ف هیجان گروهی.

**وروژان:** توُڕەبوُنی بەکۆمەڵ ف بەهیجان آمدن گروهی.

**وروژاندن:** توُڕەکردن‌و شڵەژاندنی بەکۆمەڵ: (زەردەواڵەی **وروژاندوە**) ف بە هیجان آوردن گروهی.

**وروژاو:** توُڕەکراو بە دنەدان ف بەهیجان آمدە، برانگیختە.

**وروژم:** پەلاماری بەکۆمەڵ ف هجوم.

**وروژم‌هێنان:** پەلامارداني بەکۆمەڵ ف هجوم آوردن.

**وروژە:** بەتەوژم‌هاتنی کۆمەڵ ف با فشارآمدن، ریزش کردن.

**وروستەی:** پێهەڵچوُن ف بالا رفتن از کوە و درخت.

**وروکــان:** تێوروکان، دەورەدان لە هەمولایەکەوە ف پیرامون گرفتن از هر سو.

**ورە:** ١) ورار، زراو، ئازایی، تین‌وتــاوی دڵ؛ ٢) ورنــگ ف ١) زَهــرە، شجاعت؛ ٢) زمزمهٔ زیرلبی.

**وڕە:** ١) برسیەتی، برچێتی، نێزی؛ ٢) دەنگی بەپــەلەسوڕانی چەرخ یا ناوبــەتاڵ: (فڕۆکە **وڕەی** دێت)؛ ٣) چەقە، چەنەبازی؛ ٤) مێشوُلەی نۆبــەتێ؛ ٥) وڕە، پەمــوی تازە هەلاجی‌کراو؛ ٦) بەردەلان ف ١) گرسنگی؛ ٢) صدای ماننــد صدای هواپیمــا؛ ٣) وراجی؛ ٤) پشــهٔ مالاریا؛ ٥) پنبهٔ واخیدهٔ پاك شدە؛ ٦) سنگلاخ.

**وڕەبۆسکە:** گیایەکە ف گیاهی است.

**وره‌بوڵکه:** گیایه‌که ف گیاهی است.
**وره‌بــه‌ر:** به‌تـرس، ترسێ که پیاو له کارو ئازایه‌تی ده‌خـا: (شـاخێکی سه‌خت‌و وره‌به‌ره) ف سهمناك.
**وره‌به‌ردان:** ۱) زراوچوُن؛ ۲) ناهومێدبوُن ف ۱) زَهره‌ترك شدن؛ ۲) نومیدشدن.
**وره‌چوُن:** زراوچوُن ف زَهره‌ترك شدن.
**ورۆس:** ئاڵودار، داری داره‌ڕای خانوُ ف تیرهای چوبی سقف.
**ورۆو:** ره‌وه‌ده، گه‌له‌ی به‌رازو گورگ ف گلهٔ گرگ و گُراز.
**وره‌واره:** گونـدێکه له کوردستان به‌عسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.
**وره‌وو ر:** ورنگه‌ی له‌سه‌ریه‌ك، ورنگه‌ورنگ ف زمزمهٔ زیرلبی.
**ورۆوڕ:** ده‌نـگـی گه‌وره‌و گڕی سوُڕانـی شتێ ف صدای گوش خراش چرخیدن چیزی.
**وری:** چغه‌به، ده‌نگدانی کسوٚك که بێده‌نگ‌بێ ف امر به‌ساکت شدن سگ.
**وڕی:** گێژی، سه‌رگێژی ف گیجی.
**وریا:** زرنگ، به‌هوٚش، زیره‌ك ف زرنگ، هوشیار.
**وریاوا:** له‌و گوندانه‌ی کوردستانه که به‌عسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.
**وریای:** به‌نینوٚك خوراندن ف خاریدن.
**وریسته‌ی:** رابوُن، بڵندبوُنه‌سه‌رپا ف برخاستن.
**وریسکه:** بروسکه، بریسکه ف برق ابر.
**وریش:** گرشه، بریقه ف درخشش.
**وریشن:** گرشه‌دار ف درخشان.
**وریشه:** بریقه، ورشه، گرشه ف درخشش.
**وڕین:** بڕین، له‌ت‌کردن به تیخ ف بریدن.
**ورینــــگ:** ۱) ورار، وره، زراو، قه‌وه‌تی دڵ؛ ۲) ورنـگ، گوٚرانی له‌ژێر لێوان؛ ۳) ئوٚقره، ئارام ف ۱) قوّت قلب، شجاعت؛ ۲) زمزمهٔ زیرلبی؛ ۳) قرار، آرام.
**وړینگه:** ورینگ ف نگا: ورینگ.
**وڕینه:** وڕاوه، راواندن، پاته‌ران ف هذیان.
**وڕێنه:** وڕینه ف هذیان.
**وڕینه‌وه:** ۱) به‌س کردن له قسه: (سا توخوا بی‌وڕه‌وه)؛ ۲) بڕینه‌وه‌ی دار به ته‌ورو مشار ف ۱) پایان دادن به سخن؛ ۲) بریدن درخت و کنده.
**وریه‌و:** هه‌رکام، هه‌ریه‌ك ف هرکدام.
**وز:** ده‌نگی مێش‌و زه‌رگه‌ته ف صدای مگس و زنبور، وز.
**وزاق:** ۱) ده‌رپه‌ڕینی به‌ته‌وژم؛ ۲) ئاویتن ف ۱) جهش، پرش؛ ۲) پرت.
**وزاق‌به‌ستن:** ده‌رپه‌ڕین‌و بازی گه‌وره بردن ف جهیدن و پریدن.
**وزاقدان:** وزاق‌به‌ستن ف جهیدن، پریدن.
**وزای:** فڕێدان، ئاویتن ف انداختن، پرت کردن.
**وزتن:** وزای ف انداختن.
**وزم:** داره‌ڕه‌ش، ناره‌وه‌ند ف درخت نارون.

**وزْن‌تاش:** نـاوی دێیه‌کـه له کوردستان ف نـام روستایی است درکردستان.
**وزْن‌ده‌ره:** نـاوی دێیه‌کـه له کـوردستان ف نام روستایی است در کردستان.
**وزْن‌قشلاغ:** ناوی دێیه‌که له کوردستان ف نام روستایی است در کردستان.
**وزوْ:** ئه‌خا ف می اندازد.
**وزوُ:** ئه‌خه‌م ف می اندازم.
**وزوْز:** ۱) ده‌نگی کوڵینی ئاو؛ ۲) هاشـه‌ی مار ف ۱) صدای جوشیدن آب؛ ۲) صدای مار.
**وزوُش:** ئه‌یخه‌م ف می‌اندازمش.
**وزه:** ۱) توانا، قه‌وه‌ت، تاقه‌ت؛ ۲) گه‌مه‌یه‌که، جوٚرێ‌کایه‌س ف ۱) تاب و توان؛ ۲) نام نوعی بازی است.
**وزه‌نگی:** ئاوزه‌نگی، زه‌نگو ف رکاب.
**وزه‌وز:** ۱) ده‌نگی درێژی مێش‌و زه‌رده‌واڵه؛ ۲) برێتی له سرته‌کردن ف ۱) وزوز؛ ۲) کنایه از پچ‌پچ.
**وزین:** ئاویتن ف پرتاب کردن.
**وژ:** ۱) ده‌نگی ئاوێژراوی زوٚر به‌تـه‌وژم: (بـه‌ردی به‌ره‌قانی وژه‌ی هات، وژه‌ی گولله بو)؛ ۲) برژ، براژ، بنـه‌مـای برژانن واتـا: برژاندن؛ ۳) بنه‌مای بژاردن، نه‌قاندن، وژاردن ف ۱) صدای دررفتن سنگ و گلوله؛ ۲) برشتن؛ ۳) گزیدن.
**وژاردن:** بژاردن، نه‌قاندن ف برگزیدن، گزیدن.
**وژانن:** ۱) برژاندن؛ ۲) بژاردن ف ۱) برشتن؛ ۲) گزیدن.
**وژاو:** ئاودێری له‌سـه‌ریه‌کی نه‌مـامی تازه‌چه‌قاو ف آبیاری پیاپی نشا و نهال تازه نشانده.
**وژدن:** هه‌ستی دڵ‌و ده‌رون ف وجدان.
**وژنگ:** ئه‌ژنوٚ، زرانی، چوٚك ف زانو.
**وژه:** ۱) ده‌نگی تونـدی با؛ ۲) ده‌نگی گولله؛ ۳) پازناوی ئاسیاو ف ۱) صدای تندباد؛ ۲) صدای گلوله؛ ۳) اهرم چوبین در آسیاب.
**وژه‌ك:** فیشه‌که‌شێته ف فشفشه، موشك آتشبازی.
**وس:** ۱) بێده‌نـگ؛ ۲) فه‌رمان به بێده‌نگ‌بوُن ف ۱) خاموش، ساکت؛ ۲) هیس، خاموش باش.
**وسا:** ۱) ئاوها، به‌م‌جوٚره؛ ۲) ئوستا ف ۱) اینطور؛ ۲) استادکار.
**وسار:** هه‌وسار، وه‌سار، په‌تی‌هه‌واڵی‌ره‌شمه ف افسار.
**وسان:** ئاوا، به‌م‌جوٚره ف اینطور، بدینسان.
**وسبوُن:** بێده‌نگ‌بوُن ف ساکت شدن.
**وسبین:** وسبوُن ف ساکت شدن.
**وست:** ۱) وس؛ ۲) خه‌وت ف ۱) نگا: وس؛ ۲) خوابید.
**وستا:** ئوستا ف استادکار.
**وستان:** ۱) راوه‌ستان؛ ۲) سه‌ورگرتن ف ۱) ایستادن؛ ۲) صبرکردن.
**وستن:** ۱) ئاویتن؛ ۲) خواستن ف ۱) پرتاب کردن؛ ۲) خواستن.
**وستــه:** ۱) که‌متـرین‌ده‌نـگ: (وستـه‌ت لێ‌نه‌یه)؛ ۲) خوازراو ف ۱)

[ف] ۱) شاخۀ چوب دوشاخه؛ ۲) دامنۀ خیمه.

**هاچەر:** هاچار [ف] کلید.

**هاچەسو:** ناوی دێیەکە [ف] نام روستایی است.

**هادار:** ئادار، نەجوڵ، بێ‌بزاو [ف] بی حرکت، ساکن.

**هادر:** دەس‌بەجێ، بێ‌درەنگ‌کردن [ف] فوراً.

**هادری:** هادر [ف] فوراً.

**هادی:** ناوی پیاوانە [ف] نام مردانه.

**هار:** ۱) سەگێ کە لە نەخـــۆشی مێشکـەوە شێت بو بێت؛ ۲) برێتی لە پیاوی بەدفەڕو بەئازار؛ ۳) برێتی لە مرۆی زیرەك‌و وریا؛ ۴) برێتی لە ئۆقـرەنـەگر؛ ۵) خوار، ژێر، ژێرو [ف] ۱) هار، سگ هار؛ ۲) کنایه از مردم‌آزار؛ ۳) کنایه از زبرو زرنگ؛ ۴) کنایه از ناآرام؛ ۵) پایین، پایینی.

**هاڕ:** ۱) ئامرازی وەك‌ئارد وردکردن؛ ۲) کەسێ کە شتێ وەك ئارد لێ‌دەکا؛ ۳) بەرداش [ف] ۱) ابزار آردکردن؛ ۲) کسی که چیزی را آرد کند؛ ۳) سنگ آسیا.

**هاڕئاسیاو:** بەرداش [ف] سنگ آسیا.

**هاڕا:** وردکرا، کرا بە آرد [ف] خرد شد، آرد شد.

**هارام:** هێدی، هێمن، ئارام [ف] آرام.

**هاڕان:** وردبوُن، بەئاردبوُن [ف] خردشدن مانند آرد.

**هاڕاندن:** ۱) وردکردن وەك ئارد؛ ۲) نارەتەلێدان [ف] ۱) خردوخاك کردن؛ ۲) نعره‌زدن، غرنبیدن.

**هاڕاو:** وردکراو [ف] خردشده، آردشده.

**هاڕاوە:** خاکە، شتێ کە وەك‌ئاردی لێ‌کراوە [ف] خاکه، ریزۀ خردشده.

**هاربر:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد [ف] روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**هاربـوُن:** ۱) نەخـۆشی‌مێشك گرتن، توُشی نەخۆشی هاری هاتن؛ ۲) برێتی لە بەدفەڕی [ف] ۱) هارشدن، بەبیماری هاری گرفتار شدن؛ ۲) کنایه از مردم‌آزاری و موذیگری.

**هارتوهورت:** هات‌وهوت [ف] لاف و گزاف.

**هارد:** ئارد، دەخڵی لەئاش‌و دەستاڕ لێ‌کراو، واتا هاڕدراو [ف] آرد.

**هاڕدرا:** کرابەئارد [ف] آردشد.

**هاڕدراو:** هاڕاو [ف] آردشده.

**هاڕراو:** هاڕدراو [ف] آردشده.

**هاڕڕاوە:** هاڕاوە [ف] خاکە، ریزۀ کوبیده.

**هاڕە:** دەنگی زۆر بەتەوژمی دڵ‌لەرزێن [ف] غرنبه.

**هارسم:** ۱) بەرسیلە؛ ۲) ئاوی بەرسیلە [ف] ۱) غوره؛ ۲) آب غوره.

**هارمـەنـدە:** توُکێکە ژن ئەیکەن واتا: هاربی توُشی ئەونەخۆشیە بی کە سەگی پی‌هاردەبێ [ف] نفرین زنانه، هارشوی.

**هارمێ:** هرمی [ف] گلابی.

**هاروّ:** ئەمڕۆ، ئیرۆ [ف] امروز.

**هاروُ:** ۱) پوك، پدو؛ ۲) ئارو، خەیار؛ ۳) شەویلکە، شەویلاکە [ف] ۱) لثه؛ ۲) خیار؛ ۳) آرواره.

**هاڕۆسارە:** ئەمڕۆسبەی، تەفرەدان [ف] امروز و فرداکردن.

**هاروهاج:** ۱) بزۆزو ئۆقرەنەگر؛ ۲) شەڕفرۆش‌و بەتەشقەڵە [ف] ۱) ناآرام و بازیگوش؛ ۲) ستیزه‌جو.

**هاروێ:** ۱) ئارو، هاروُ، خەیار؛ ۲) پوك، پدو، هاروُ [ف] ۱) خیار؛ ۲) لثه.

**هاڕە:** ۱) هاڕرە، نەعرەتە، نارەتە؛ ۲) بەرداش؛ ۳) تڕتڕە [ف] ۱) غرنب؛ ۲) سنگ آسیا؛ ۳) قارقارك.

**هاڕەدەسی:** دەستاڕ [ف] دستاس.

**هاڕەکردن:** ۱) نەڕاندن؛ ۲) تێك‌ڕوخانی چیا، داڕوخان [ف] ۱) نعره‌زدن؛ ۲) فروریختن کوه.

**هاڕەگـل:** ۱) دەستـاڕ؛ ۲) جون، بەردی لەجێگەی دەسکاونگ [ف] ۱) دستاس؛ ۲) هاون سنگی.

**هاڕەماسی:** هەڕەماسی، جۆرێ ماسی [ف] ارّه ماهی.

**هاڕەهاڕ:** هاڕەی زۆر، دەنگی زەلامی بەسام [ف] غرنبۀ بسیار.

**هاری:** ۱) ئاری، ئاریکاری؛ ۲) نەخۆشی شێت بوُنی سەگ؛ ۳) برێتی لە شەڕفرۆشی‌و ئازاردانی خەڵك [ف] ۱) کمك؛ ۲) بیماری هاری؛ ۳) کنایه از ستیزه‌جویی و مردم‌آزاری.

**هارێ:** بەلێ، ئارێ [ف] آری.

**هاڕی:** وردی‌کرد وەك ئارد [ف] آرد کرد.

**هاڕێ:** ۱) تڕتڕە؛ ۲) لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد [ف] ۱) قارقارك؛ ۲) روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**هاڕیا:** هاڕدرا، هاڕا [ف] آرد شد.

**هاڕیاگ:** هاڕاو [ف] خردشده.

**هاڕیان:** هاڕان [ف] خردشدن.

**هاڕیاو:** هاڕیاگ، هاڕاو [ف] خردشده.

**هاریای:** تەشەنەکردو، پێوەچوُنی نەخۆشی [ف] زخم یا بیماری پیشرفته.

**هاریك:** گونـدێکی کوردستـانـە بەعسی وێرانی کرد [ف] از روستاهای ویران شده توسط رژیم بعث عراق در کردستان.

**هاریکار:** ئاریکار، کەسێ کە کۆمەگ بە یەکێ دەکا [ف] کمك کننده.

**هاریکاری:** ئاریکاری، کۆمەگ [ف] کمك.

**هاریکە:** کۆمەگی بکە [ف] کمکش کن.

**هاریکەر:** هاریکار [ف] کمك کننده.

**هاڕین:** وردکردن وەك ئارد [ف] آرد کردن.

**هاڕینـەوە:** وەك ئارد وردکردن: (ئەم‌دەرمانە **بهاڕەوە‌و** دە چاوتی‌کە) [ف] کوبیدن و آسیاب کردن.

**هاڕیە:** کرمی دارو شینایی، تڕتڕە [ف] کرم آفت سبزی و درخت.

**هاز:** ۱) کاردو، کاردی؛ ۲) پیازەخوُگانە [ف] ۱) نگا: کاردو، گیاهی است؛ ۲) گیاهی است وحشی شبیه پیاز.

**هازا:** ۱) ئێرە؛ ۲) لەوێ، لە وێدەرێ [ف] ۱) اینجا؛ ۲) درآنجا.

**هازار:** ۱) ئازار، ژان، ئەزیەت؛ ۲) دەجار سەت، هەزار [ف] ۱) آزار؛ ۲) هزار.

**هازە:** ۱) دەنگی زۆر باریکی ئاوی سەرئاور: (**هازەی سەماوەر دێت**)،

گیزه؛ ۲) کاردو ف ۱) صدای آب روی آتش قبل از جوشیدن؛ ۲) نگا: کاردو.

**هازه‌په‌لك:** جۆرێ کاردو ف نوعی گیاه «کاردو».

**هازه‌خۆگانه:** جۆرێ کاردو ف نوعی گیاه «کاردو».

**هازه‌ڕه‌شه:** جۆرێ کاردو ف نوعی گیاه «کاردو».

**هازه‌کوڕانه:** جۆرێ کاردو ف نوعی گیاه «کاردو».

**هازه‌کوڕه:** جۆرێ کاردو ف نوعی گیاه «کاردو».

**هازه‌مارانه:** جۆرێ کاردو ف نوعی گیاه «کاردو».

**هازه‌هاز:** گیزه‌گیزی سه‌ماوه‌ر ف صدای سماور.

**هاژ:** ۱) هاج، گێژ، سه‌رسام؛ ۲) بنه‌مای هاژان واتا: به‌رزو نه‌وی‌بونی سه‌رسنگ له‌ نه‌فه‌س‌ته‌نگی ف ۱) سراسیمه، هاج‌وواج؛ ۲) بالا و پایین رفتن سینه از نفس تنگی.

**هاژان:** هاژ، به‌رزو نه‌وی‌بونی سنگ ف بالا و پایین رفتن سینه.

**هاژۆ:** ئاژۆ، لێخوڕ ف راننده.

**هاژۆت:** ۱) رابردو بۆ لێخوڕین: (ئێستره‌کانی **هاژۆت**)؛ ۲) په‌لامار، وروژم ف ۱) راند؛ ۲) هجوم، یورش.

**هاژۆتاندن:** ۱) لێخوڕین؛ ۲) دنه‌دان ف ۱) راندن؛ ۲) تحریك کردن.

**هاژۆتکار:** په‌لامارده‌ر، وروژم‌که‌ر ف یورش‌آور، مهاجم، حمله‌ور.

**هاژۆتن:** ۱) لێخوڕین، ئاژۆتن؛ ۲) په‌لاماردان ف ۱) راندن، رانندگی؛ ۲) حمله‌بردن.

**هاژۆتی:** ۱) لیی‌خوڕی؛ ۲) لێخوڕدراو ف ۱) راند؛ ۲) رانده‌شده وسیلهٔ راننده.

**هاژۆتێ:** په‌لاماری بۆکرد ف به وی حمله کرد.

**هاژۆتیار:** په‌لامارده‌ر ف نگا: هاژۆتکار.

**هاژۆر:** لێخوڕ ف راننده.

**هاژوواژ:** هاج وواج ف گیج و منگ، هاج وواج.

**هاژه:** ۱) ده‌نگی گه‌ڵاو لك له‌به‌ر با؛ ۲) ده‌نگی ئاوهه‌ڵدێر ف ۱) صدای تندباد برشاخسار؛ ۲) صدای آبشار.

**هاژه‌ك:** فیشه‌که‌شێته ف موشك، فشفشه.

**هاژه‌کردن:** هاژه‌کردن، ده‌نگی داڕوخانی به‌ردو ئاخ له‌سه‌رڕا ف صدای فروریختن کوه و سنگ.

**هاژیان:** هاژان ف بالا و پایین آمدن سینه.

**هاژێله:** کوژه‌که ف نوعی خرمهره.

**هاژین:** هاژیان، هاژان ف نگا: هاژیان.

**هاس:** ۱) هاز، کاردو؛ ۲) جانه‌وه‌رێکی دڕنده‌یه له‌پڵنگ چکۆله‌ترو به‌ڕه‌نگی پلنگ، دووڕه‌شێر؛ ۳) خواز، خواست؛ ۴) ترس، باك؛ ۵) ئاگاکردن، حه‌س، حه‌سان، پێ‌حه‌سان ف ۱) گیاه «کاردو»؛ ۲) یوزپلنگ؛ ۳) خواست؛ ۴) ترس و بیم؛ ۵) حسّ، احساس.

**هاسان:** ۱) سانا، ئاسان؛ ۲) به‌رده‌سان ف ۱) آسان؛ ۲) فسان.

**هاسان‌بژیو:** که‌م‌خه‌رج ف کم مخارج.

**هاسانی:** سانایی ف آسانی.

**هاسایش:** چاوپێ‌که‌وتن، دیدارکردن ف دیدارکردن.

**هاست:** ئاشت، بێ قارکردن ف آشتی، قهرنکرده.

**هاسلی:** ئاکام، نه‌تیجه ف نتیجه، حاصل.

**هاسلی که‌لام:** پوخته‌ی وتار ف خلاصهٔ کلام.

**هاسۆ:** ئاسۆ ف افق.

**هاسێ:** عاسێ، سه‌خت‌و دژوار ف سخت و دشوار.

**هاش:** ۱) بێ‌نرخ، نه‌ئشت، بێ‌به‌هره، به‌هیچێ؛ ۲) خه‌به‌ری ئه‌و: (**هاش** لێ نیه واتا: خه‌به‌ری نیه)؛ ۳) تامه‌زرۆیی؛ ۴) وچان، راوه‌ستان؛ ۵) ئاشت، ئاشتی؛ ۶) تینوه‌تی زۆر ف ۱) بی‌ارزش؛ ۲) خبراو؛ ۳) اشتها و آرزوی شدید؛ ۴) مکث، توقّف کوتاه؛ ۵) آشتی؛ ۶) تشنگی شدید.

**هاشا:** ۱) حاشا؛ ۲) ده‌ست‌هه‌ڵگرتنی ژن له مێرد ف ۱) انکار؛ ۲) صرف‌نظر کردن زن از زندگی با شوهر، تصمیم به جدایی از شوهر.

**هاشت:** نێوان‌خۆش، ئاشت ف باهم در صلح و آشتی.

**هاشت کرن:** رازی کردن ف راضی کردن.

**هاشرمه:** که‌ژوێ که ده‌کرێته پاڵو ف رانکی.

**هاشۆشه:** هاوسا ف همسایه.

**هاشوهۆش:** شات‌وشوت ف لاف و گزاف.

**هاشمه:** ۱) هه‌یف، مانگی به‌عاسمانه‌وه؛ ۲) مانگانه، کرێی مانگ‌به‌مانگ، ئاشمه ف ۱) ماه، قرص ماه؛ ۲) ماهیانه، ماه‌به‌ماه.

**هاشه:** ۱) هاژه؛ ۲) خۆهه‌ڵکێشان، مه‌حتی‌خۆکردن ف ۱) نگا: هاژه؛ ۲) لاف.

**هاشه‌که‌ر:** خۆهه‌ڵکێش، که‌سێ مه‌حتی خۆ ده‌کا ف لاف‌زن.

**هاشه‌وهۆشه:** هاشوهۆش ف لاف و گزاف.

**هاشه‌هاش:** هاژه ف نگا: هاژه.

**هاف:** ۱) نك، کن، جه‌م، لا، بال؛ ۲) پانایی سه‌ربان، روکاری ده‌ره‌وه‌ی بان؛ ۳) نهۆمی سه‌ره‌وه، باڵه‌خانه ف ۱) نزد، پیش؛ ۲) پشت‌بام، نمای بیرونی بام؛ ۳) طبقهٔ بالای ساختمان.

**هافڕ:** ۱) ئاخوڕ؛ ۲) تفاق، کاو گیای عه‌نبارکراو ف ۱) آخور؛ ۲) علوفهٔ انبارشده.

**هافڕدان:** عه‌نباری گیاو تفاق ف انبارعلوفه.

**هافل:** ئاکام، نه‌تیجه ف نتیجه.

**هاڤ:** ئام، ئاو، وته‌ی شه‌ریکی له ڕه‌نگ‌و خو یا له هه‌رشتێ: (**هاڤمال** واتا: ئاوسا) ف هم، کلمهٔ اشتراك.

**هاڤا:** داروکه‌یه‌که به کونی نیری گای‌دا ده‌که‌ن ف چوبکی در یوغ.

**هاڤاژ:** به‌قه‌د لازم قسه بکه، قسه‌ی زیاد مه‌که ف زیادحرف نزن.

**هاڤاژه:** هاڤاژ ف نگا: هاڤاژ.

**هاڤال:** دۆست، ئاواڵ ف دوست، رفیق.

**هاڤڕ:** ۱) هافڕ، ئاخوڕ؛ ۲) ئاوڕ، لاکردنه‌وه ف ۱) آخور؛ ۲) عطف توجّه، التفات، برگشتن و نگریستن.

**هاڤڕقه‌دان:** ئاوڕدانه‌وه ف به‌پشت سرنگاه کردن.

**هاڤڕقێدان:** ئاوڕلێ‌دانه‌وه ف توجّه به طرف چیزی یا کسی معطوف داشتن.

**هاڤڕك:** مله‌که‌ر، که‌سێ ده‌گه‌ڵ یه‌کێ به‌ربه‌ره‌کانی ده‌کا ف هم‌چشم.

**هاڤرکێ:** کێ بەرکێ، رك بەرکێ ف هم چشمی.

**هاڤرێ:** ۱) ئامرا؛ ۲) دۆست ف ۱) همراه؛ ۲) دوست.

**هاڤرێژ:** رەحەت بوُنی ژن ف آسودن زن از همخوابگی.

**هاڤـل:** ۱) بەهـرەی کار، بەروبـو؛ ۲) نەترسان لە کارو مل پێوەنان؛ ۳) کۆشش و تەقالا؛ ۴) ئاریکاری، یارمەتی ف ۱) بهرهٔ کار؛ ۲) اقدام؛ ۳) کوشش؛ ۴) یاری، کمك.

**هاڤل بوُن:** بەهرەدیتن، قازانج کردن ف سودبردن.

**هاڤل کرن:** بەهرە پێدان ف سوددادن.

**هاڤلیك:** ۱) گیاگەسك؛ ۲) گەسك ف ۱) گیاه جارو؛ ۲) جارو.

**هاڤلێك:** گەسك، گژگ، گێزك ف جارو.

**هاڤن:** ئاونگ، دەسکاونگ ف هاون، هاونگ.

**هاڤۆتن:** فێر بوُن، هەڤۆتن ف یادگرفتن، آموختن.

**هاڤە:** لەولاوە ف از آنسو.

**هاڤـەین:** ۱) تۆزقـاڵ، کەمـوسکـە: (**هاڤەینێ ترسێ لبا من نینە**)؛ ۲) هەوێن، ئامیان ف ۱) مقدار بسیار کم؛ ۲) مایە، خمیرمایە.

**هاڤی:** نامۆ، غەوارە ف بیگانە، غریبە.

**هاڤێ:** بنەما لە هاڤیتن، فڕێدان، ئاویژتن: (**ناهاڤێ، دهاڤێ**) ف پرت. ریشهٔ «هاڤیتن» بە معنی پرت کردن.

**هاڤیت:** ئاویتی ف پرت کرد.

**هاڤیتن:** ئاویشتن ف پرت کردن.

**هاڤیتە:** ئاوێژراو، فڕێدراو ف پرت شدە.

**هاڤێتەر:** فڕێدەر ف پرت کنندە.

**هاڤیژی:** ئێرەیی، بەغیلی ف حسادت.

**هاڤین:** ۱) تاوسان؛ ۲) ئامیان، هەوێن ف ۱) تابستان؛ ۲) مایە.

**هاڤێن:** ئامیان، هەوێن ف مایە، خمیرمایە.

**هاڤیناپاشین:** مانگی ئاب، ئاغستۆس ف ماه اوت، مرداد و شهریور.

**هاڤیناپێشن:** مانگی حوزێران ف ماه ژوئن، خرداد و تیر.

**هاڤینامیرشەرەف:** برێتی لە مانگی ڕەزبەر ف کنایە از مهرماه.

**هاڤینـاناوین:** ۱) چلەی هاوین؛ ۲) برێتی لە گەرمای زۆر ف ۱) وسط تابستان؛ ۲) کنایە از گرمای شدید.

**هاڤین چێن:** هاوینە، شیناوەرد ف کشت صیفی.

**هاڤین ڤان:** کوێستانچی ف چادرنشین ییلاق‌رو.

**هاڤین ڤانی:** چوُنەهەوار ف بە ییلاق رفتن.

**هاڤینگە:** زۆزان، ئێلاق، وار ف ییلاق.

**هاڤینۆك:** ڕۆژانی گەرمی بەهار کە ئاژەڵ تێردەخوا ف روزهای گرم بهار.

**هاڤینەچەر:** لەوەڕگەی پوُش‌وپار ف مرتع تابستانی.

**هاڤینەسەر:** جلکی هاوینە، پۆشاکی تاوسانی ف پوشاك تابستانی.

**هاڤینەوار:** هاڤینگە ف ییلاق.

**هاڤینەهەوار:** هاڤینەوار ف ییلاق.

**هاڤینی:** هاڤین چێن، شیناوەرد ف کشت صیفی.

**هاق کەنی:** ئەگەر خوات خۆش دەوێ. وتەیەکە *لەباتی* تکایە ف خواهشمندم.

**هاقە:** هەق لە بەرانبەر کار، مز، مزە ف مزد.

**هاکا:** ۱) بەونزیکانە، زۆری نەماوە؛ ۲) بەم جۆرە، بەوتەرزە ف ۱) نزدیك است، چیزی نماندە؛ ۲) این طور، چنین.

**هاکو:** لەکوێیە، لەکام جێگەیە؟ ف کجا است؟.

**هاکۆ:** ۱) نشگاف، لەبڕ؛ ۲) نەدیتە کڕین یان کارگرتن ف ۱) یکهو؛ ۲) ندیدخریدن یا کارکردن.

**هاگ:** خا، هیلکە ف تخم پرندە.

**هاگا:** ئاگا، خەبەر: (**هاگام لێ نیە**) ف آگاهی.

**هاگۆس:** تەختەزەوی خەت‌دراو بۆ ڕۆژەجوُت، هۆگان ف قطعەزمین ویژهٔ شخم روزانە.

**هاگە:** هاگ ف تخم پرندە.

**هاگەبان:** راوکە، مارکە ف نگا: مارکە.

**هاگەوان:** مارکە، راوکە، رامك ف نگا: مارکە.

**هاگی:** خەوەر، دەنگ‌و باس، خەبەر ف خبر.

**هاگی‌دار:** ۱) وریا، وشیار؛ ۲) لەسەرهەست ف ۱) هوشیار؛ ۲) گوش بە زنگ.

**هال:** ۱) نەمام؛ ۲) درم، پەتا، ئازار ف ۱) نهال؛ ۲) آفت.

**هاڵ:** ۱) ئاڵ، جنۆکەی زەیستان کوژ؛ ۲) بەرزایی کێو کە پیاو بۆ خوارێ بڕوانێ گێژدەبێ؛ ۳) ئاڵ، ددانی کولبوُگ لە ترشی؛ ۴) تراویلکە؛ ۵) ئاغەڵی مەڕ؛ ۶) ئەشکەوت؛ ۷) رەنگی ئاڵ؛ ۸) کاڵ، رەنگ‌نەماو؛ ۹) چۆنیەتی، حاڵ؛ ۱۰) قۆرە، بەرسیلە ف ۱) آل، موجود خیالی کە زائو را می‌میراند؛ ۲) بلندی کوه؛ ۳) دندان کندشدە از ترشی؛ ۴) سراب؛ ۵) آغل حیوانات؛ ۶) غار؛ ۷) سرخ روشن؛ ۸) رنگ رفتە؛ ۹) حال؛ ۱۰) غورە.

**هالاّ:** ۱) هاڤـاڵ، دۆست، ئاواڵ؛ ۲) پەنـای پەنابردن؛ ۳) هاگا، خەبەر، ئاگا؛ ۴) دادو فەریاد ف ۱) دوست، رفیق؛ ۲) التجا؛ ۳) اطّلاع؛ ۴) داد و فغان.

**هالان:** ۱) نەمـامـان؛ ۲) دنەدان، هانەدان؛ ۳) قیڕەو هەراو قوُلە ف ۱) نهالها؛ ۲) تشجیع، برانگیختن؛ ۳) سروصداوجنجال.

**هالاّن:** ۱) هەڤالاّن؛ ۲) پێچان ف ۱) دوستان؛ ۲) پیچش.

**هالاّو:** ۱) تینی گەرمای زۆر بەتەوژم؛ ۲) بوخ لەبەر گەرما؛ ۳) گۆشتاوی بە بەرسیلە ف ۱) وزش گرمای شدید؛ ۲) بُخار؛ ۳) آبگوشت با غورە.

**هاڵ بردنـەوە:** بێهۆش بوُنی زەیستان لە دەست جنۆکە ف بیهوش شدن زائو از ترس آل.

**هاڵ بوُنەوە:** کول‌بوُنی دیان لە ترش‌خواردن ف کند شدن دندان از ترشی.

**هال کەتن:** توُشی وەبا بوُن ف دچار وبا شدن.

**هالمەوت:** هەڵامەت، پەسیف ف زکام.

**هالو:** لالۆ، خاڵ، برای دایك ف دایی.

**هالۆ:** ئاوا، ئاوها، ولۆ ف چنین.

**هاڵۆ:** دیزە، دەفری گڵینی شێوتێدالێنان ف دیگ گلی، دیزی.

**هالوا:** خاڵ، برای دایك ف دایی.

**هاڵوبلاڵوك:** بەلاڵوك ف آلبالو.
**هاڵوبەلاڵوك:** بەلاڵوك ف آلبالو.
**هاڵۆز:** ١) ئاڵۆز، تێكهالاو؛ ٢) برێتی لە پیاوی بەدفەڕو شەڕانی ف ١) درهم، سردرگم؛ ٢) كنایه از آدم شارلاتان.
**هالوزا:** خالۆزا ف دایی‌زاده.
**هاڵۆزان:** تێكهالان، ئاڵوزبوون ف درهم ریختن، سردرگم شدن.
**هاڵۆزاو:** تێكهالاو، هاڵۆز ف درهم ریخته، سردرگم.
**هاڵۆزبوون:** هاڵۆزان ف سردرگم شدن.
**هالـۆق:** نەخـۆشیەكـە تۆشی ئەنـدامـانی شەرمدێ ف نوعی بیماری اندامان تناسلی.
**هالوه:** گۆزه ف كوزه.
**هاڵوهەواڵ:** دەنگ‌وباس ف خبر.
**هاڵوێن:** خۆش‌كردنی خیگە بە دەرمانات ف دباغ دادن خیگ با دواجات.
**هاڵوێنی:** قەیسی دەنك‌شیرن، شەلانی ناوكەخۆشە ف زردالوی هسته شیرین.
**هاله:** میمك، خوشكی دایك ف خاله.
**هاڵـــه:** ١) بەرسیلە، هاڵ؛ ٢) جۆرە دومـــەڵێكـە سپی‌واش؛ ٣) ئاڵـەی نەخۆشی پێستی دەم‌وچاوی ژنی زگ‌پڕ؛ ٤) گوندێكە لە كوردستان ف ١) غوره؛ ٢) نوعی دُمل؛ ٣) لكه‌های صورت زن حامله؛ ٤) نام دهی است.
**هاڵەبەلاڵوك:** بەلاڵوك ف آلبالو.
**هاڵەپڕووز:** پڕووزان ف پخس.
**هاڵەپڕووزبوون:** پڕووزان ف پخسیدن.
**هالەت:** ١) چۆنەتی؛ ٢) ئامراز؛ ٣) گاسن ف ١) حالت؛ ٢) ابزار؛ ٣) گاواهن.
**هالەزا:** میمكزا ف خاله‌زاده.
**هاڵەژێر:** ئەوەتا لە خوار ف درپایین است.
**هاڵەژێر:** خونچەی تازەهەڵپێچراوی دارمێو ف شكوفهٔ نودمیدهٔ درخت مو.
**هاڵەژێل:** هاڵەوژێر ف نگا: هاڵەژێر.
**هاڵەكۆك:** ئاڵەكۆك ف نگا: ئاڵەكۆك.
**هاڵـەوبـوون:** ١) هاڵ‌بوونـەوە؛ ٢) ئۆقرە گرتن ف ١) كندشدن دندان از ترشی؛ ٢) آرام گرفتن.
**هاڵەوكردن:** ئارام‌كردنەوە، داسەكناندن ف آرام كردن.
**هالەین:** هێلانە ف آشیانه.
**هاڵی:** ١) تێگەیشتو، حاڵی؛ ٢) بەتاڵ، والا، خاڵی ف ١) حالی، ملتفت؛ ٢) خالی.
**هاڵێ:** هاڵ، بەرسیلە، قۆرە ف غوره.
**هالێ‌بوون:** خەبـەرلێ‌بوون، ئاگابـوون: (**هـام لێ نیه، هات لێ نیه**) ف اطّلاع داشتن بر.
**هالیر:** دۆ، دەو ف دوغ.
**هالێن:** ١) هێلان، هێلین، هێلانـە، هێللانـە؛ ٢) جۆلانەی منالی ساوا، دەیدیك ف ١) آشیانه؛ ٢) ننو.
**هالی‌هازر:** ١) لە ئێستەدا؛ ٢) ئەوی هەیە ف ١) حال حاضر؛ ٢) آنچه موجود است.
**هام:** ١) وام، ئەوەتام: (**هام لێره**)؛ ٢) ئام، وێنە، بەرانبەری: (**هام‌دەرد**)؛ ٣) هات: (**هام‌وشۆ**) ف ١) اینك هستم؛ ٢) حرف شراكت، هم؛ ٣) آمدن.
**هاما:** ١) هەر ئەمەسە؛ ٢) لەودەمەدا؛ ٣) گریمان ف ١) همین است؛ ٢) درآن هنگام؛ ٣) فرضاً.
**هامار:** دەشت، راست‌و تەخت، گۆڕ ف راست و هموار.
**هاماری:** گۆڕایی، جێگەی بێ‌كەندو كلۆ ف همواری زمین.
**هامبار:** عەنبار، هەمار، هەمبار ف انبار.
**هامبێز:** ئامێز، باوەش ف آغوش.
**هامپا:** ئامپا ف همپا.
**هام‌پیاڵه:** ١) كەسانێ كە پێكەوە شەراب دەخۆنەوە؛ ٢) برێتی لە دۆستی گیانی ف ١) هم‌پیاله؛ ٢) كنایه از دوست جانی.
**هامتا:** لنگە، ئاوتا ف همتا.
**هام‌تەراز:** بەرانبەر ف برابر، هم‌تراز.
**هام‌تەرازو:** بەرانبەر ف برابر.
**هام‌دەرد:** لە خەم‌و خەفەتدا بەرانبەر ف همدرد.
**هام‌دەم:** ئاودەم، ئاودەنگی ف همدم.
**هامڕا:** ١) ئاواڵ، دۆست؛ ٢) رەفیقی سەفەر؛ ٣) لە بیرو ڕادا شەریك ف ١) دوست، رفیق؛ ٢) همراه؛ ٣) هم‌عقیده.
**هامراز:** ئامراز، ئامیر، ئەسپاب، ئەسپابات ف ابزار.
**هامڕاز:** دۆستی زۆر نزیك ف همراز.
**هامڕایی:** ١) رەفیقـاتی لە سەفـەردا؛ ٢) شەریكی لە بیرو ڕادا ف ١) همراهی؛ ٢) هم عقیده بودن.
**هامڕیش:** ئاواڵ‌زاوا ف باجناغ.
**هامزا:** دوانە، ئاواڵ‌دوانە، جمك، جوی، لفەدوانە ف همزاد.
**هامسا:** ئاوسا، جیران ف همسایه.
**هامساڵ:** لە تەمەندا بەرانبەر ف همسال.
**هام‌سایه:** جیران، ئاوسا ف همسایه.
**هام‌سنوور:** هاوكەوشەن ف هم مرز.
**هام‌سەر:** برێتی لە ژن بۆ مێرد ف همسر.
**هام‌شان:** لە قەدرو پایەدا بەرانبەر ف هم‌شأن.
**هام‌شكڵ:** لە بیچم‌و تەرزا وەك یەك ف هم‌شكل و هم‌قیافه.
**هام‌شۆ:** ئاموشۆ ف آمدوشد.
**هام‌شوو:** دوژنی مێردێك ف دوزن یك شوهر، دوهوو.
**هام‌شیر:** دو شیرەخۆره كەمەمكێكیان مژی‌بێ ف همشیر.
**هام‌شیره:** هام‌شیر ف همشیر.
**هام‌عومر:** لە تەمەندا بەرانبەر ف هم‌سال.
**هام‌قەر:** هاوتەمەن، هاوعەمر ف هم‌سنّ.
**هاملكان:** ئەمریكایی ف امریكایی.

**هامن:** ۱) تاوسان؛ ۲) ئەوەتا من: (**هامن** چەئێژی؟) ف ۱) تابستان؛ ۲) اینك من.

**هامۆتا:** بێ سەرو شوێن ف مفقودالاثر.

**هامۆش:** ئارام، هێدی، هێمن ف آرام.

**هامۆشۆ:** ئامۆشۆ، هامشۆ، هاتوچۆ ف آمدوشد.

**هام‌وەوی:** دوژنی دوبرا لە ماڵێکا ف دوجاری، همسران دوبرادر.

**هامەیش:** هاتن، ئامان ف آمدن.

**هامیتە:** ئاوێتە، تێکەڵ کراو ف آمیختە.

**هامێز:** ئامێز، باوەش، هامبێز ف آغوش.

**هامین:** تاوسان ف تابستان.

**هان:** ۱) دنە؛ ۲) وان، ئەوەتان ف ۱) تحریك؛ ۲) اینك هستند.

**هانا:** ۱) پەنا، لەبەرپاڕانەوە بۆ دادپرسین: (**هانام** بردەبەر)؛ ۲) ئەوجۆرە، ئاوها: (بۆ شتێ **هانا** نابێ پیاو تۆڕەبێ)؛ ۳) سۆمایی، قەوەتی دیتن ف ۱) پناه بردن و دادخواهی؛ ۲) این طور؛ ۳) سو، نیروی بینایی.

**هانابردن:** پەنابردن بۆ فریاڕەس: (**هانام** بردەبەر خوا دە**هانام هات**) ف پناه‌بردن به فریادرس.

**هانجی:** دیسان، دوبارە ف دوباره.

**هان‌دان:** دنەدان ف تحریك کردن.

**هاندۆ:** هێند، هێمابۆ ئەندازە ف مقدار، اشاره به اندازه.

**هاندێ:** هاندۆ ف نگا: هاندۆ.

**هانقار:** دەوروبەری ئاوایی ف حومه.

**هانقاس:** هانقار ف حومه.

**هانقەراس:** هانقار ف حومه.

**هانکە:** نەفەسی توند لەبەر ماندوەتی ف هن‌هن.

**هانکەهانك:** هانکەی بەشوێن یەکدا ف هن‌هن.

**هانگ:** بەزم‌و ئاهەنگ ف بزم و جشن.

**هانـوهـوُن:** پاشگـوێ‌خستنی کار، کاردواخستن بەقەستی ف درنگ و کاهلی کردن، پشت گوش انداختن.

**هانە:** ۱) کانی، سەرچاوە؛ ۲) دنە، هان؛ ۳) ئەوەتان؛ ۴) ئەوەتا؛ ۵) هانکە ف ۱) چشمه؛ ۲) تحریك؛ ۳) اینك اینها، اینهاشان؛ ۴) این است؛ ۵) هِن خسته.

**هانەدان:** دنەدان، هان‌دان ف تحریك کردن.

**هانەدرۆزنە:** کوێرەکانی، کانی‌یەك کە تاوسان ئیشك ئەکا ف چشمه‌ای که در تابستان می‌خشکد.

**هانەژاڵ:** گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**هانـەسـوُرە:** لەو گونـدانـەی کوردستـانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**هانەگەرمەڵە:** ۱) گڕاو، سەرچاوەی ئاوی گەرم‌و سوێر؛ ۲) گوندێکە لە کوردستان ف ۱) چشمهٔ آب معدنی گازدار؛ ۲) نام دهی است.

**هانەهانە:** ۱) دنە، هان، هانە؛ ۲) هانکەهانك ف ۱) تحریك؛ ۲) هِن‌هِن.

**هانەهانەدان:** دنەدان ف تحریك کردن.

**هانەهانەکردن:** هانکەهانك‌کردن ف هِن‌هِن کردن.

**هانـەی‌دل:** لەو گونـدانـەی کوردستـانـە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**هانەی‌قول:** گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کـرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**هانی:** ۱) ئاوردی، ئانی، ئینای؛ ۲) ئەمەسا ف ۱) آورد؛ ۲) اینك.

**هانێ:** ۱) وەرگرە، بگرە: (**هانێ** پارەکەت، **هانێ** نان بیخۆ)؛ ۲) ئەوەکە: (ئەو مرۆڤێ **هانێ** واتا: کاوراکە) ف ۱) بگیرش، ازدستم بگیر؛ ۲) آن یارو.

**هانیاگ:** ئاوەردە ف آورده.

**هانیاو:** هانیاگ ف آورده.

**هانیشك:** ئانیشك ف آرنج.

**هانیشکە:** ئانیشکە ف زانوی لوله‌بند.

**هانین:** ئاوەردەن، ئانین، ئینان ف آوردن.

**هانینە:** ئانیە، ئینایە ف آورده است.

**هانینەوە:** ۱) ڤەئینان، گێڕانەوە؛ ۲) برێتی لە چارەکردنی لەجێ‌چوُگ: (ناوکمی **هانیەوە**) ف ۱) بازآوردن؛ ۲) کنایه از به‌جای آوردن از جا دررفته.

**هانی‌یۆ:** هەر ئەمەسە، چیتر نا، چیتر نیە ف همین است.

**هاو:** ۱) ئام، هام؛ ۲) وتەی بانگ‌لێ‌کردن لە دوُر؛ ۳) چلۆنایەتی، حاڵ؛ ۴) ئەو ف ۱) حرف شراکـت، هم؛ ۲) حرف ندا برای دور؛ ۳) چگونگی؛ ۴) او.

**هاوا:** ۱) حاڵ‌و هەوا، چلۆنـەتی؛ ۲) هۆ، سەبـەب؛ ۳) هەوا، کژ ف ۱) چگونگی؛ ۲) علّت، سبب؛ ۳) هوا.

**هاوار:** ۱) بانـگ‌ڕاهێشتن بۆ ئاریکـاری‌و ڕەهـابـوُن لە تەنگـانـە؛ ۲) دەنگ‌بڵندکردنی توند؛ ۳) دادکردن؛ ۴) ئاخ‌و داخ؛ ۵) فریاگەیشتن؛ ۶) هانـا؛ ۷) ناوە بۆ دو گۆڤـاری کوردی یەکەمیان جەلادەت عالی بەدرخـان لە ساڵی ۱۹۳۲دا دەری‌خست کە بە تێکڕایی ۵۷ ژمارەی دەرچـو دوهـەمیان حافـز مستـەفـا قازی ساڵی ۱۹۷۱ لە بەغـدا دەری‌خست پاش سێ‌ژمارە داخرا؛ ۸) لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف ۱) فریاد کمك خواستن؛ ۲) فریاد، صدای بلنـد؛ ۳) دادخواهی؛ ۴) دریغ؛ ۵) به‌فریاد رسیدن؛ ۶) پناه به کسی بردن؛ ۷) نام دو مجلّهٔ کردی که در سالهـای ۱۹۳۲ و ۱۹۷۱ منتشر می‌شدند؛ ۸)روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**هاواربردنەبەر:** هانابردنەبەر ف پناه بردن به‌کسی.

**هاواربۆبردن:** هاواربردنەبەر ف پناه بردن به کسی.

**هاواربـۆهەستان:** ئاریکاری گشتی بۆ نەجات کەس یان کەسانێ ف بسیج همگانی برای کمك و نجات کسی یا گروهی.

**هاواربۆهێنان:** هاواربردنەبەر ف پناه بردن به‌کسی.

**هاواربەماڵم:** حەیف‌و مخابن، داخ‌و عەزرەت ف دریغا، اسفا.

**هاوارتەلەمن:** خراپم لێ‌قەوماوە ف بد آورده‌ام.

**هاوارکردن:** ۱) دەنگ‌بڵندکردن بۆ ئاریکاری؛ ۲) قیژاندن لەبەرئێش‌و

ناڕەحەتی ف ۱) فریاد برآوردن برای کمك؛ ۲) فریادکشیدن از شدّت درد.

**هاوارکرن:** هاوارکردن ف نگا: هاوارکردن.

**هاوارکرۆخ:** هاوارکەر، خودانی بانگ‌و هاوار ف فریادکننده، جیغ کش.

**هاوارکەر:** زیڕەکەر ف فریادکننده، جیغ کش.

**هاوارەلەمن:** هاوارتەلەمن ف بدآورده‌ام.

**هاوارهەستان:** لێ‌قەومانی گشتی ف فاجعهٔ عمومی.

**هاواڵ:** ئاواڵ ف رفیق.

**هاواڵ دوانە:** ئاواڵدوانە، جمك، جوی، لفەدوانە ف همزاد.

**هاواڵ دەرس:** ئامدەرس، دوکەس کە پێکەوە خوێندویانە ف همدرس.

**هاواڵ زاوا:** ئاواڵزاوا، هامڕیش ف باجناغ.

**هاواڵ کراس:** ئاواڵکراس، ئاوەڵکراس ف شلوار زنانه.

**هاوان:** ۱) ئاونـگ، دەسکاونگ؛ ۲) جۆرێ تۆپی شەڕ: (ئەسپابی شەڕ پەیاکەن/ تفەنگ‌و تۆپی **هاوان**) «حاجی قادر» ف ۱) هاون؛ ۲) خمپاره‌انداز.

**هاوانتە:** ۱) ئاوانتە، مفتە؛ ۲) فێڵ‌و گزی ف ۱) مفت؛ ۲) حیله و نیرنگ.

**هاوانتەچی:** فێڵباز، دەسبڕ ف ناروزن.

**هاوانتەخۆر:** مفتەخۆر ف مفتخور.

**هاوباز:** مناڵدان ف زهدان.

**هاوبازو:** ڕەفیق، ئاریکاری یەکتر ف رفیق، همدست.

**هاوبازی:** ڕەفیق لە گەمەو کایەدا ف همبازی.

**هاوباڵ:** ئاریکار ف کمك و یاور.

**هاوبەر:** ۱) بەرانبەر؛ ۲) دوقوماشی لە پانایی‌دا بەرانبەر ف ۱) برابر؛ ۲) دوپارچهٔ هم‌عرض.

**هاوبەش:** شەریك ف شریك.

**هاوبەشی:** شەریکایەتی ف شراکت، شرکت.

**هاوبیجم:** هاوڕەنگ، لەشکلا چون یەك ف همرنگ، هم‌شکل.

**هاوبیر:** لە بیر و ڕادا وەکو یەك ف هم‌عقیده.

**هاوپا:** ئامپا، لە کسب‌و کار وەك یەك ف همپا.

**هاوپشت:** ۱) بەرەی باوکێك: (خزمی **هاوپشت**، برای **هاوپشت**)؛ ۲) دوکەس سوارێ یەکسمێ ف ۱) از یك تیره و طایفه؛ ۲) دونفر سوار بر یك ستور.

**هاوپشتە:** هاوپشت ف نگا: هاوپشت.

**هاوپشك:** هاوبەش ف شریك.

**هاوپۆل:** هاودەرس ف همکلاس.

**هاوپەیمان:** دوکەس کە بەڵێنی ئاریکاریان بە یەکتر داوە ف هم‌پیمان.

**هاوپیاڵە:** هام‌پیاڵە ف نگا: هام پیاڵه.

**هاوپیشە:** ئامپا، هاوپا ف همپا، هم‌پیشه.

**هاوتا:** لنگە، هامتا ف همتا.

**هاوتای:** حەفتا، سێ‌چەل بیست‌و دە ف هفتاد.

**هاوتەحر:** هامشکڵ ف هم‌شکل.

**هاوتەرح:** هاوتەحر ف هم‌شکل.

**هاوتەراز:** بەرانبەر ف هم‌تراز.

**هاوتەرازو:** هامتەرازو ف برابر.

**هاوتەك:** ۱) لنگە، هاوتا؛ ۲) رفیق، هاواڵ ف ۱) همتا؛ ۲) رفیق.

**هاوتەمەن:** هامساڵ ف همسال.

**هاوتیرە:** ۱) هاوتەمەن؛ ۲) لەعەشیرەتێ ف ۱) همسال؛ ۲) از یك عشیره.

**هاوتێس:** حەڤدە، دەو حەوت ف هفده.

**هاوتێسن:** حەڤدەهەم ف هفدهم.

**هاوجسن:** ۱) هاوتەرح؛ ۲) بەرەی باوکێ ف ۱) همگونه؛ ۲) از یك طایفه.

**هاوجفت:** ۱) هاوتـەك، لنگە؛ ۲) برێتی لە ژن‌و مێرد، نێرەو مێوە ف ۱) همتا؛ ۲) کنایه از جفت نر وماده.

**هاوجڵەو:** سوارێ کە دایم دەگەڵ ئاغا سەفەر دەکا ف سوار ملازم رکاب، هم‌عنان.

**هاوجوُت:** ۱) هاوجفت؛ ۲) دوجوت‌بەندە کە زەویەکانیان لە پەنا یەکترە؛ ۳) ژنی حەڵاڵ: (مەلا دەڵێن بە **هاوجوُتی** بە هاو سەرینی) ف ۱) نگا: هاوجفت؛ ۲) دوکشاورز همسایه در زمین؛ ۳) کنایه از همسر.

**هاوجۆر:** هاوتەرح ف هم‌شکل.

**هاوجەم:** دوکەس کە لە خواردندا پێکەوەن ف همخوان، هم‌سفره.

**هاوجێ:** دوکەس کە لە یەك جێ‌دا دەخەون ف هم‌بستر.

**هاوچاخ:** کەسانێ کە لە دەورانێکا ژیان ف معاصر.

**هاوچاو:** کەسێ کە ڕکەبەری دەکا ف هم‌چشم.

**هاوچڕە:** ۱) کەسێ کە گۆرانی بۆ گۆرانی‌بێژ دەگێڕێتەوە؛ ۲) دوکەس کە پێکەوە گۆرانی دەڵێن ف ۱) عضو گروه کُر آواز؛ ۲) دوهمخوان آواز.

**هاوچەرخ:** هاوچاخ ف معاصر.

**هاوچەشن:** هاوجۆر ف هم‌شکل.

**هاوخـــاك:** دوکـــەس کە زەویەکـانیان لێك دەگەڕێتـەوە، هاوجـوُت ف دوکشاورز با زمینهای هم‌مرز.

**هاوخوان:** هاوجەم ف هم‌سفره.

**هاوخوشك:** دەستەخوشك ف دوزن دوست خواهرمانند.

**هاودەرد:** بە دەردی یەکتر توُش بوُن ف همدرد.

**هاودەس:** چەند کەسی شەریك لە کەین‌و بەین‌دا ف شریك و همدست در توطئه.

**هاودەست:** هاودەس ف نگا: هاودەس.

**هاودەم:** هامدەم، ئاودەنگ ف همدم.

**هاودەنگ:** ۱) ئاودەنگی؛ ۲) هاوبیر ف ۱) همدم، انیس؛ ۲) هم عقیده.

**هاودین:** چەند کەسانێ لەسەر ئاینێ ف هم‌کیش.

**هاوڕ:** ئاوڕ ف واپس‌نگری.

**هاوڕا:** ۱) ڕەفیق؛ ۲) هاوبیر ف ۱) همراه، رفیق؛ ۲) هم‌عقیده.

**هاوڕاز:** دۆستی زۆر نزیك ف همراز.

**هاوران:** ۱) جۆرێ پاڵـتـــاو؛ ۲) ناوی دەشتێکی پان‌و هەراوە لە نێوان دەجلەو فورات ف ۱) نوعی پالتو؛ ۲) دشتی وسیع میان دجله وفرات.

**هاورد:** ١) ئانی؛ ٢) بەهرەی کشتو کاڵ ف ١) آورد؛ ٢) فراوردهٔ کشاورزی.

**هاوردن:** ئانین، ئاوەردە ف آوردن.

**هاوردنەوە:** ١) وەگەڕاندن؛ ٢) رشانەوە ف ١) بازگرداندن؛ ٢) قی کردن.

**هاوردنەوەسۆ:** کولاندنەوەی برین ف تازە کردن زخم.

**هاوردە:** ئاوردە، لەلاوە هانیاگ ف از خارج واردشده، آوردە.

**هاوردی:** ١) هاوردە؛ ٢) ئانی، ئینا ف ١) واردە؛ ٢) آورد.

**هاوڕو:** ئاوڕو، ئابڕو ف آبرو.

**هاوڕێ:** ١) هاواڵ؛ ٢) رەفیقی سەفەر ف ١) دوست، رفیق؛ ٢) همراه.

**هاوڕێزە:** شیاو بۆ یەکتر ف متناسب.

**هاوڕیش:** ١) گێچەڵ تێهاڵاندن؛ ٢) هاوزاوا ف ١) درگیر نزاع؛ ٢) باجناغ.

**هاوڕیش بوُن:** بەزۆر شەڕپێ فرۆشتن: (هەر لەخۆوە بێ سەبەب هاوڕیشم بو بەگژماهات) ف اجباراً کسی را درگیر نزاع کردن.

**هاوڕیشم:** ئاوریشم ف ابریشم.

**هاوزا:** هاوتەمەن ف همسال.

**هاوزاوا:** ئاواڵزاوا ف باجناغ.

**هاوزگە:** هاوزا ف همسال.

**هاوزمان:** دوکەس کە قسە بە زوانێ دەکەن ف همزبان.

**هاوزە:** هاوزا ف همسال.

**هاوزێ:** ١) هاوزا؛ ٢) خۆوڵاتی ف ١) همسال؛ ٢) هموطن.

**هاوزێد:** خۆوڵاتی ف هم‌میهن.

**هاوژین:** ١) خافڵان: (ئەو منداڵەی بهاوژێنە)؛ ٢) هاوجوت، ژن و مێرد ف ١) سرگرمی؛ ٢) همسر، شریك زندگی.

**هاوس:** ئاوس، زگ‌پڕ ف آبستن.

**هاوسا:** ١) جیران، دراوسێ؛ ٢) ئاوسا، پەنەما، ئەستوُربو ف ١) همسایە؛ ٢) ورم کرد.

**هاوساڵ:** هاوتەمەن ف همسال.

**هاوسان:** ماسین، پەنەمان، ستوُربوُن ف آماسیدن.

**هاوسایەتی:** جیرانەتی ف همسایگی.

**هاوسایی:** هاوسایەتی ف همسایگی.

**هاوسفرە:** هاوخوان، هاوجەم ف هم سفرە، همخوان.

**هاوسك:** ئاواڵدوانە، جمك ف همزاد.

**هاوسنوُر:** دو پارچەخاکی بەیەکەوەنوُساو ف هم‌مرز.

**هاوسۆند:** هاوپەیمان ف هم‌پیمان.

**هاوسوێن:** هاوپەیمان ف هم‌پیمان.

**هاوسوێند:** هاوپەیمان ف هم‌پیمان.

**هاوسەر:** ئاوجوُت، هام‌جوُت ف همسر.

**هاوسەرین:** ئاوجوُت: (ئەوکچەی خۆمدا بە تۆ بە هاوجوُتی بە هاوسەرینی) ف همسر.

**هاوسەفەر:** هام‌سەفەر، رەفیقی ڕا، ئامڕا ف همراه، همسفر.

**هاوسەنگ:** ١) لە کێشاندا بەرانبەر؛ ٢) لە ئاکاردا وەك یەك ف ١) هم‌وزن؛ ٢) همسنگ، شبیه هم.

**هاوسەنگەر:** لە مەیدانی شەڕا ئاواڵو ئاریکاری یەکتر ف هم‌سنگر.

**هاوسێ:** جیران، ئاوسا ف همسایە.

**هاوسێتی:** هاوسایەتی ف همسایگی.

**هاوسێیەتی:** هاوسێتی ف همسایگی.

**هاوسێیی:** هاوسێتی ف همسایگی.

**هاوشاخ:** عەریف، غەنیم ف هم‌زور.

**هاوشاری:** پێکەوە خەڵکی باژێڕێك ف همشهری.

**هاوشان:** هام‌شان ف هم‌شأن، هم‌پایە.

**هاوشۆ:** هامشۆ، هام‌وشۆ ف آمدوشد.

**هاوشیر:** هام‌شیر ف همشیر.

**هاوشیرە:** هام‌شیرە ف همشیرە.

**هاوعومر:** هاوتەمەن ف همسال.

**هاوقان:** بەندبوُن بەشتێکەوە: (دامێنم دەوداره **هاوقا**) ف گیرکردن به چیزی.

**هاوقسە:** پێك‌هاتگ ف هم‌قول.

**هاوقەتار:** ١) رەفیق، دۆست؛ ٢) پێکەوە لەکارێکدا، سنف ف ١) رفیق؛ ٢) همقطار.

**هاوقەد:** لەبالادا بەرانبەر ف درقد و قامت متساوی، همقد.

**هاوقەدەح:** هاوپیاڵە، هام‌پیاڵە ف نگا: هاوپیاله.

**هاوقەدەم:** کەسانێ کە پێکەوە بۆ کارێ دەچن ف همقدم.

**هاوکات:** هاوچەرخ، هاوزەمان ف همزمان.

**هاوکار:** ١) پێکەوە لەکارێکدا؛ ٢) ئاریکار ف ١) همکار؛ ٢) کمك کنندە.

**هاوکاری:** ئاریکاری ف همکاری، کمك کردن در کار.

**هاوکاسە:** بریتی لە دۆستی نزیك ف همکاسە.

**هاوکایە:** هاوبازی ف همبازی.

**هاوکوف:** ژن و مێردێ لە پلەو پایەو ڕەسەندا وەك یەك ف زن و شوهر همپایە وهم‌نژاد، هم‌کفو.

**هاوکەوشەن:** دوزەمین کە سنوُریان لێك دەگەڕێتەوە، هاوخاك ف هم‌مرز.

**هاوکێش:** هاوسەنگ ف هم‌وزن.

**هاوگا:** دوگا بەرانبەر بە یەکتر کە پێکەوە جوُت دەکەن ف هم‌یوغ.

**هاوگەر:** بەستە، سەربە ف منسوب.

**هاوگەمە:** هاوبازی ف همبازی.

**هاوگیان:** ژنی برای مێرد ف زن برادر شوهر، جاری.

**هاول:** گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**هاوڵ:** ١) وروژم، پەلامار؛ ٢) چارە، عیلاج ف ١) حمله، هجوم؛ ٢) چاره، علاج.

**هاوڵان:** ١) پێکەوە لە یەك هێلانە؛ ٢) بریتی لە دودۆست کە دایم پێکەوەن ف ١) هم‌آشیان؛ ٢) کنایه از دودوست بسیار به هم نزدیك.

**هاوڵف:** ١) ئاواڵدوانه؛ ٢) هاواڵ ف ١) دوقلو؛ ٢) دوست.

**هاوله:** ١) باش، چاك؛ ٢) هێژا، بەنرخ؛ ٣) لەجێ، بەجێ ف ١) نیك؛ ٢) ارزشمند؛ ٣) مناسب.

**هاوڵە:** ئاوڵە، خوریکە، خورێڵکە ف آبله.

**هاولەچك:** دوژن لەپایەدا بەرانبەر ف دوزن هم‌شأن.

**هاوڵەڕو:** ئاوڵەڕو، مرۆی گڕۆێ ف آبله‌رو.

**هاوڵە کوت:** خوریکەکوت ف آبله‌کوب.

**هاوڵە کوتان:** دەرزی لێدان بۆ خوریکە ف آبله‌کوبی.

**هاوڵێ:** هاوڵە، ئاوڵە ف آبله.

**هاوماڵ:** ١) شەریك، هاوبەش لەماڵدا؛ ٢) هاوسا ف ١) شریك درخانه؛ ٢) همسایه.

**هاومل:** هاوشان ف هم‌شأن.

**هاون:** ١) خەون؛ ٢) خەوتن ف ١) رؤیا، خواب؛ ٢) خوابیدن.

**هاوْن:** ئاونگ، دەسکاونگ، هاڤن ف هاون.

**هاونا:** دوباره، دیسان، هەمیسان ف دوباره.

**هاوناو:** کەسانێ کە ناوێکیان لێ‌نراوە ف همنام.

**هاونۆبە:** کەسانێ کە لە ئێشك گرتنا پێکەوەن ف یاور در نوبت.

**هاونۆگە:** هاونۆبە ف یاور در نوبت.

**هاونوێن:** هاوجێ‌خەو، دوانی لە یەك‌جێ‌دا خەوتو ف همبستر.

**هاونیر:** هاوگا ف هم یوغ.

**هاونیشتمان:** هاوزێد ف هم‌میهن.

**هاونیله:** بریتی لە ژنی شو ف کنایه از همسر.

**هاونیڵە:** هاوگا ف هم یوغ.

**هاووْ:** هەرئەمەسە ف همین است.

**هاوولاتی:** هاوزێد ف هم‌میهن.

**هاووەزن:** هاوکێش ف هم‌وزن.

**هاوه:** ١) بەرێ‌وجێ؛ ٢) بەکـارهاتگ، بەکەلك؛ ٣) کەڵك، بەهره ف ١) بجا؛ ٢) بدردبخور؛ ٣) بهره.

**هاوها:** زەنازەنا ف هیاهو.

**هاوهاو:** ١)بانگ‌کردنی لەدوورەوە؛ ٢) گۆزەی ڕاوکەران بەشوێن نچیردا ف ١) آهای؛ ٢) سروصدای شکارچیان به دنبال نخجیر.

**هاوەڵ:** هاواڵ ف رفیق.

**هاوەڵ کراس:** ئاواڵ‌کراس، هاواڵ‌کراس ف شلوار زنانه.

**هاوهێلان:** هاولان ف هم‌آشیان.

**هاوی:** ١) تەرە، ئاوارەو سەرگەردان؛ ٢) گەللایی، نیمەلێوە، شێتۆکە ف ١) ویلان؛ ٢) خُل، نیمه‌دیوانه.

**هاویتن:** ئاویتن، فڕێدان ف انداختن، پرت کردن.

**هاویتە:** بێچوی بەمردوویی لەدایك‌بوگ: (بزنەسپی بەرهاویتە) ف جنین مرده بەدنیا آمده.

**هاوید:** داغی دروشمی ماڵات ف داغ حیوانات اهلی.

**هاویدور:** هەمولایەکی شتێ یا کەسێ، هاویردور ف دورواطراف.

**هاویر:** ١) دەوره، نکال، تەرەف، لا؛ ٢) بلاو، لێك‌جیا ف ١) طرف، سو؛ ٢) پراکنده.

**هاوێر:** ١) لە ئێکتر جیاکردنەوەی ماكو زا؛ ٢) دەوره، هەرچوارلا ف ١) ازهم جداکردن مادر و بچه در گله؛ ٢) دور، چهارطرف.

**هاوێردوْر:** هەمولا، دەوروبەر ف همه‌طرف، دوروبر.

**هاوێژ:** ١) پاشگـری بەمـانا کەسێ کە فڕێ‌دەدا؛ ٢) کەسێ دەتەقێنێ: (گوللەهاوێژ) ف ١) پسوند به معنی انداز؛ ٢) پسوند به معنی شلیك کننده.

**هاویژتن:** ١) فڕێدان، تۆردان؛ ٢) تەقـاندن: (گولله بهـاوێژه) ف ١) انداختن، پرت کردن؛ ٢) شلیك کردن.

**هاویشتن:** هاویژتن ف نگا: هاویژتن.

**هاویل:** چاره، عیلاج ف چاره، علاج.

**هاوین:** تاوسان، هامن ف تابستان.

**هاوینگه:** وار، جێ‌ژیانی خێلات لە زۆزان ف ییلاق.

**هاوینه:** شیناوەرد، بێستانو شتی وا کە بەهار دەچێنرێ ف کشت بهاره که در تابستان بهره دهد، صیفی.

**هاوێنه:** ئاوێنه، عەینك، جام، قۆدی، قودیك، مریك ف آیینه.

**هاوینەوار:** هاوینگه ف ییلاق.

**هاوینەهەوار:** هاوینگه ف ییلاق.

**هاوینی:** ١) هاوینـه؛ ٢) جلكو شتێ کە بۆ هاوین باشـه ف ١) کشت تابستانی، صیفی؛ ٢) لباس سبك و خُنك تابستانی.

**هاهـ:** پەك، پەحا، تەح، وتەی سەیرمان ف کلمهٔ تعجّب.

**هاهـا:** ١) وتـەی جواب بۆ کەسێ قسـەی باوەڕپێ‌نەکراو دەکا: (هاها چبـوه؟)؛ ٢) لەو دوورەوە دیاره: (هـاها ئەوەتا من دیومه) ف ١) کلمهٔ جواب در برابر شنیدن سخن باورنکردنی؛ ٢) کلمهٔ نشان دادن چیزی در فاصلهٔ دور.

**هاهاو:** بانگ کردنی دوور ف آهای، ندای دور.

**های:** ١) خەبـەر، ئاگا؛ ٢) وتـەی سەیرمان؛ ٣) وتەی بەمانا ئاخو دەرد: (هـای لە منی ماڵوێران)؛ ۴) ئامـادەی: (های لە کوێ، تۆیش های لەگره)؛ ۵) خۆزی؛ ۶) هەی هاوار ف ١) اطّلاع؛ ٢) حرف تعجّب؛ ٣) حرف تأسف؛ ۴) هستی؛ ۵) کاش؛ ۶) آی داد، هوار.

**هایا:** ١) ئاگادار؛ ٢) وشیار، زرینگ؛ ٣) هەر ئەوەندەو بەس ف ١) آگاه، مطّلع؛ ٢) هوشیار، زرنگ؛ ٣) فقط همینقدر و بس.

**های‌بەخت:** ١) خۆو بەخت، هاتونەهات؛ ٢) شت بە قورعە بەرکەوتن ف ١) بسته به شانس؛ ٢) لاتاری.

**هایت:** تۆ هەی: (ئێمرۆ هایت لە بازاڕ) ف تو هستی.

**های‌دار:** بەئاگا، خەبەردار، ئاگادار ف مطّلع، آگاه.

**هایدان:** ئاگادارکردن، خەبەرپێدان، وشیارکردنەوە ف آگاه کردن.

**هایدوت:** ١) چەتـەگەل، یاغی‌گەل؛ ٢) ڕێگـر، چەتـە ف ١) راهـزنان، یاغیان؛ ٢) راهزن.

**هایدی:** لەسەری بڕۆ، هایدێ ف نگا: هایدێ.

**هایدێ:** وشەیەکە بۆ دنەدان لە کار، ئادەی ف کلمهٔ تشجیع برای کار کردن.

**های ژێ:** خەبەردارلە: (هایم ژێ نیە، **های ژێ** نیە) ف باخبر از.

**هایسان:** ئایسان، پێبوُن ف افروختگی.

**های لمن:** هاوارتە لەمن ف وای برمن.

**هایلۆ:** ١) وتـەی بانـگ‌کردنی پیاوی نەنـاس لەدوُرەوە؛ ٢) ئەی داخ‌و حەیف؛ ٣) ئاوایە؟؛ ۴) ناسـك‌نارنجی، نازونـوُزکـەر؛ ۵) ئای چەند بەستەزمانە! ف ١) ندای دور ویژۀ مردان؛ ٢) دریغ و اسف؛ ٣) چنین است؟؛ ۴) نازك نارنجی؛ ۵) وه‌چه مظلوم است!.

**هایلێ:** ١) بانگ کردنی ژنێ لەدوُر؛ ٢) داخ‌و دەرد؛ ٣) ئاگادار، خەوەردار ف ١) ندای دور ویژۀ زنان: ٢) دریغا: ٣) مطّلع.

**های لێ‌بوُن:** ئاگالێ‌بوُن: (فلانکەس **های لێ‌یە** ئەو کاورایە لە کوێ‌یە) ف اطّلاع داشتن.

**هاین:** هەین: (سو **هاین** لە مالْ هالْوٚم) ف هستیم.

**هاینە:** ١) ئاشکرا، دیار؛ ٢) بێ‌گومان ف ١) آشکار؛ ٢) حتماً، بدون شك.

**های‌وهو:** زەناو چەقە ف هیاهو.

**هایە:** ١) هەرئەمەندە؛ ٢) وشیار، زرینگ ف ١) همینقدر؛ ٢) هوشیار.

**های‌های:** ١) وتـەی سەیرمـان؛ ٢) وتـەی گاڵتـەپێ‌کردن ف ١) کلمۀ تعجّب؛ ٢) کلمۀ تمسخر.

**های‌هو:** وتەیەکە بەمانا زۆر دوُرە، پێك‌نایە ف دور از دسترس، دور از سرانجام.

**هایی:** خەبەر، های، ئاگا ف آگاهی، اطلاع.

**هایێ:** وتـەی سەرەتـای لاوك بەمانا ئەی دۆست ف کلمۀ آغاز ترانه به معنی ای دوست.

**هبر:** مەرەکەف، رەنگ بۆ شت‌نوُسین ف مرکّب.

**هبربار:** ئیربار، دەفری ناومالْ، کاسەو گۆزە ف ظروف خانگی.

**هبوُدی:** ١) بەرتیل؛ ٢) بەخشش، خەلاّت ف ١) رشوه؛ ٢) انعام.

**هجران:** ١) بەلاّو نسیبەت؛ ٢) هۆ، سەمەد، سەبەب ف ١) بلا و مصیبت؛ ٢) علّت، سبب.

**هجره:** حوجره ف حُجره.

**هجنان:** سوێنە، تەشتی لەسوالْەت ف تشت سفالین.

**هجـوّل:** ١) بەپـەرّەکـراو؛ ٢) قژن‌و بلاّو: (ژنکێ پۆپ**هجـوّل**) ف ١) حلاّجی شده، پشم یا پنبۀ زده شده؛ ٢) ژولیده ودرهم.

**هچنە:** کەم‌وایە، کەمتر هەلْدەکەوێ ف بەندرت.

**هچهار:** بیباری سوُر ف فلفل قرمز.

**هچ‌هچ:** دەنـگـی دەرکـردنـی پەز لە ئاغـەلْ ف صدای بیرون کردن گوسفندان از آغل.

**هر:** ڤر، ئێرە، ئەگره ف اینجا.

**هرّ:** ١) وتـەی لێخورێنی مەرّ؛ ٢) وتەی گاڵتەپێ‌کردن ف ١) کلمۀ راندن گله: ٢) کلمۀ تمسخر.

**هرتـە:** ١) هیپـە، گەوی گەوکـردن، ئالْقەی ئامرازبەستن؛ ٢) برێتی لە کەلەمچەی دەستی گراوان ف ١) حلقۀ بستن ابزار؛ ٢) کنایه از دستبندزندانیان.

**هرْچ:** ١) ورچ؛ ٢) زۆر زبر و زەلام ف ١) خرس؛ ٢) بسیار تنومند.

**هرچی‌مەندش:** زبرو زەلام لە دیمەندا ف تنومند و قوی هیکل.

**هرده:** لێره ف دراینجا.

**هرّز:** وتەی رّاگرتنی یەکسم ف کلمۀ نگهداشتن ستور.

**هرز:** ورچ ف خرس.

**هرزا:** داوەتی رّەشبەڵەکی کۆزگرتو ف نوعی رقص دسته‌جمعی.

**هرڤە:** لێرەوە ف از اینجا.

**هرم:** گرم، گرمە ف غرنب.

**هرمژاندن:** نەعرەتەلێدانی شێرو درّندە ف نعرۀ حیوانات درنده.

**هرمژین:** ١) نەعرەتە؛ ٢) گەیشتنی میوە ف ١) نعره‌زدن؛ ٢) رسیدن میوه.

**هرمەت:** ١) حورمەت، رێز، قەدر؛ ٢) برێتی لە ژنی بەمێرد ف ١) حرمت، ارج؛ ٢) کنایه از زن شوهردار.

**هرمی:** میوەیەکی زۆر خۆشە زۆر جۆری هەیە بن‌خرّی درێژوٚکەیەو پایز دەگات ف امرود، گلابی.

**هرمێ:** هرمی، هەرمێ، هەمروٚ ف گلابی.

**هرمین:** گرمەکردن ف غرنبیدن.

**هرّو:** ژیلەمۆ، زیلەمۆ ف خاکستر داغ.

**هروّر:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**هروش:** دوجار وردکراو ف دوبار خرد شده.

**هره:** ئێرە، ڤر، ڤرا ف اینجا.

**هرّهـرّ:** ١) حیلەی ئەسپ؛ ٢) وتـەی شوان بۆ خۆش‌ئاژۆتنی پەز ف ١) شیهۀ اسب؛ ٢) کلمه‌ای که چوپان برای راه‌بردن گله به‌کار می‌برد.

**هری:** خوری ف پشم.

**هرّی:** وتەی گەمەپێ‌کردن ف حرف مسخره کردن.

**هریا:** حیلاندی ف شیهه‌کشید.

**هریاشکێ:** گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدۀ کردستان توسط بعثیان.

**هریشك:** شێوێکە بۆ زەیستانی لێ‌دەنین لە ساوارو ماست‌و دۆ ف غذائی است ویژۀ زائو.

**هزار:** دەجار سەت ف هزار.

**هزارگەز:** گیایەکە بۆ دەرمان دەشێ، هەزارگەز ف گیاه هزارگوشان.

**هزر:** بیر، فکر ف فکر.

**هزوُر:** ئامادەو لەبەردەست ف حضور.

**هزێران:** ١) مانگی شەشەمی زاینی، لە بیست‌ویەکەمی مانگی بانەمەرّەوە تا سی‌ویەکـەمی جوٚزەردان؛ ٢) داری خەیزەران ف ١) ششمین ماه میلادی، ژوئن؛ ٢) درخت خیزران.

**هژا:** راژا ف تکان خورد، به اطراف جنبید.

**هژان:** ١) راژان؛ ٢) نەوی‌و بەرزبوُنی سەرسنگ لە تەنگەنەفەسی ف ١) جنبیدن به اطراف؛ ٢) بالا و پایین آمدن سینه از تنگی نفس.

**هژاندن:** راژاندن ف جنبانیدن به هرطرف.

**هژده:** هەشتو دە، هەژدە ف هیجده.
**هژدەهی:** هەژدەمین ف هیجدهمین.
**هژر:** بیر، هزر، فکر ف فکر.
**هژمار:** ژمار، ئەژمار ف شمار.
**هژمارکار:** ژماریار ف آمارگر.
**هژمە:** ١) گۆری و قوربان؛ ٢) هەشمەت: (ئەز هەژمەکارێ بەژنێ تەمە) ف ١) فدائی؛ ٢) غلام، نوکر، خدمتگزار.
**هـژمـەکـاری:** زۆر بەدڵ نۆکـەری کردنی کەسێ کە خۆشەویستە ف ازجان و دل خدمت کردن به محبوب.
**هژنۆ:** زرانی، ئەژنۆ، چۆك ف زانو.
**هژهژۆك:** دایم دەلەرزیندا ف همیشه لرزان.
**هژی:** ئاواڵمنداڵ، پەردەی منداڵدان، هەڤالۆك ف مشیمه، جفت جنین.
**هژیر:** میوەیەکـە بەڕەنـگی زەردەو ڕەنگی سوری ئامـاڵڕەش بەقـەد ئاڵو بوخارا دەبێ ناوەکەی پڕە لە دەنکی زۆر وردیلەو زۆر جۆری هەیە ف انجیر.
**هس:** وتەی لێخوڕینی مەڕ، کس، هڕ ف کلمهٔ راندن گوسفندان.
**هسان:** سان، بەردەسان، هاسان ف فسان.
**هسایە:** راوەستاو، لەسەرپا ف ایستاده، مقابل نشسته.
**هسپی:** ئەسپێ، سپێ ف شپش.
**هستر:** هێستر، ئێستر ف استر.
**هستو:** ئەستۆ، مل، نێوان سەرو سنگ ف گردن.
**هستوکورك:** ئەستۆکڕك ف نگا: ئەستۆکڕك.
**هستیفـك:** ١) ئەستێوڵك، بستەی سەر تەندوڕ؛ ٢) مەدوونە، خاکەنازی خۆڵەمێش فڕێدان ف ١) آهن روی تنور؛ ٢) خاك انداز.
**هسکو:** ئەسکوێ، ئەسکو ف ملاغه.
**هسکە:** جۆرێ تفەنگی ڕەشۆکی قەدیمی ف نوعی تفنگ قدیمی.
**هسـون:** ١) ساوین بە بەردەسـاندا؛ ٢) پیاماڵین ف ١) تیزکردن تیغ با فسان؛ ٢) ساییدن.
**هسە:** هس ف کلمهٔ راندن گوسفندان.
**هش:** ١) ئاگاکردنی لەش، ئاگاداری؛ ٢) دژوارو سەخت، وتەی فەرمان بەبێدەنگ بوون، وست؛ ٣) ناوەرۆك، ناوئاخن ف ١) هوش؛ ٢) دشوار؛ ٣) هیس؛ ۴) محتوا.
**هشار:** کوێرەڕێ بەناو شاخو بەردەلاندا ف کوره راه میان سنگلاخ.
**هشازا:** ئازاد، سەربەست، ئازادیخواز ف آزایخواه.
**هشاڤتن:** قووتدان، داقورتاندن ف بلعیدن.
**هشاندن:** بەوریایی لێکدانەوەو هەڵسەنگاندنی کارو ڕوداو ف تفکّر منطقی.
**هشپاك:** راستو دروست، دڵپاك، هزرباش ف پاکدل.
**هشتاری:** نەزان، تێنەگەیشتو ف نادان.
**هشـتـن:** ١) راگرتـن؛ ٢) بەجـێهێشـتـن، هێڵان، بەجـێهێڵان؛ ٣) ئاگاداری کردن، سەپەرشتی کردن ف ١) هشتن، نگهداشتن؛ ٢) بەجا گذاشتن؛ ٣) نگهداری و مواظبت کردن.

**هشتە:** کەلەپوور، میرات ف ارث.
**هش چالاکی:** کەمئاوەزی، بێمێشکی، گەللایی ف خُل‌وضعی. سبك مغزی.
**هش دان:** خستنەناو، دەناونان ف تو بردن، تو ریختن.
**هش سْڤك:** کەمفام، ئاقڵسووك، هەقمەق، گێلەپیاو ف کودن، سبك‌مغز.
**هش ڤەکری:** روناك‌بیر، تێگەیشتو، زرینگ، وریا، دریا ف دانا، باهوش، روشنفکر، زرنگ.
**هشك:** ١) رەق، سەخت؛ ٢) ئیشك ف ١) سخت، سفت؛ ٢) خشك.
**هشکاتی:** وشکانی، دژی دەریا ف خشکی، برّ.
**هشکارۆ:** وشکارۆ ف خشکسار.
**هشکـاندن:** ١) خشاندن، پیاساوین؛ ٢) وشك‌کردن ف ١) مالیدن بر، ساییدن؛ ٢) خشك کردن.
**هشکـاوز:** کۆکـردنـەوەی چناو زوتر لە خەڵك، زوتر لە دروێنەو گێرەو خەرمانهەڵگرتن بوونەوە ف برداشت محصول زودتر از معمول.
**هشکاوس:** وشکاوس ف بذر قبل از باران پاشیده در خشکی.
**هشکبەر:** پیتاك، باربو بۆ یاریدەی هەژاران ف اعانه، کمك مالی به فقرا.
**هشکساڵ:** وشکەساڵ، سیاساڵ ف خشکسال.
**هشکوڕ:** زۆر خاوەنهەست ف بسیار حسّاس.
**هشکەبەر:** وشکەبەرد، خانو یان دیوار کە هەر بەرد بێو قوڕی تێدا دەکار نەکرابێ، وشکەکەڵەك ف خانه یا دیوار سنگچین.
**هشکەرۆ:** وشکەڕۆ، ئیشکەڕۆ ف اسب تعلیم ندیده.
**هشکەساری:** وشکەسەرما ف سرمای بدون بارندگی، سرمای خشك.
**هشکەسڕ:** وشکەسەرما ف سرمای خشك.
**هشکەگۆشت:** گۆشتێ کە وشك‌دەکرێتەوەو بۆ زستان دەمێنێ ف گوشت خشك شده برای مصرف زمستان.
**هشکەمز:** وشکەمز، ئیشکەمز ف مزد بدون خوراك.
**هشکی:** ١) وشکی؛ ٢) بەهـەسـتو شعـوور ف ١) خشکی؛ ٢) دارای احساس و شعور.
**هشکیان:** ١) وشك‌بوون؛ ٢) برێتی لە بێبەزەیی و بێ هەستی مروڤایەتی بوون ف ١) خشکیدن؛ ٢) کنایه از بی‌رحم شدن.
**هشگۆ:** وتەی دنەدانی سەگ بۆ شەڕ ف کلمهٔ برانگیختن سگ.
**هشەك:** هەستی ئەندامانی لەش: (پێنج هشەك) ف حواسّ.
**هشی:** وشی ف خوشهٔ انگور و خرما.
**هشیار:** ١) وشیار، زرنگ، لەسەرهەست؛ ٢) لەخەوهەستاو، نەخەفتگ ف ١) هوشیار؛ ٢) بیدار.
**هشیاری:** چلۆنایەتی هشیار ف ١) هوشیاری؛ ٢) بیداری.
**هفـارە:** بنخەرمـان، دەخڵێ کە لەپـاش خەرمانهەڵگرتن دەنکەدەنکە ماوەتەوەو هەژاران دەیماڵن ف تەخرمن.
**هڤدە:** حەڤدە، شازدەو یەك ف هفده.
**هڤێز:** چنینەوەی بە تەقەڵ کە دیار ناکا ف رفو.
**هڤێژ:** هڤێز ف رفو.

**هکم:** حوکم، بڕیاری دەوڵەتی: (دەسال **هکم** دانیّدا) ف حکم.

**هکمەت:** حیکمەت: (ئەو **هکمەتا** خودیّ بو) ف حکمت.

**هکـوّ:** به چاوی بەستراو لەسەر قاچێك ڕۆیشتن، گەمەیەکە ف با چشم بسته لی‌لی رفتن، نوعی بازی است.

**هل:** ۱) پێشگـرێکـە بەمـانـا بڵنـدی، لای سەرو؛ ۲) ئەڤـراز، عەڤراز، سەربەرەژوُره ف ۱) پیشوند به معنی بالا، بر؛ ۲) سر بالایی.

**هلا:** ۱) هێشتا، هێمان؛ ۲) بەجێی‌هێشت ف ۱) هنوز؛ ۲) جاگذاشت.

**هلاب:** مانگی چاردە ف بدر، ماه شب چهاردهم.

**هلات:** ۱) رای کرد، غاریدا؛ ۲) دیاریدا، بوّ مانگو ئەستێرەو خوّر دەڵێن ف ۱) دوید، فرارکرد؛ ۲) طلوع کرد.

**هلاتن:** ۱) راکـــردن؛ ۲) تازە دیاریدانی خوّرو مانـگو ئەستێرە؛ ۳) بڵندکردن؛ ۴) هەڵگرتنی‌بار؛ ۵) هەڵاتنی‌هەویر ف ۱) فرار؛ ۲) طلوع؛ ۳) بلندکردن؛ ۴) حمل بار؛ ۵) ورآمدن خمیر.

**هلاڤیشتن:** هەڵواسین، دالەقاندن ف آویختن.

**هلاڤیتن:** بو سەرەوە ئاویتن ف رو به‌بالا پرت کردن.

**هلال:** دان‌ئاژن ف خلال دندان.

**هلاندن:** ۱) بڵندکردن؛ ۲) لابردن له جێگەی خوّی ف ۱) بلندکردن؛ ۲) جابجاکردن.

**هلانین:** ۱) هەڵگـرتن‌و هێشتنـەوە بوّ کاتی پێویست؛ ۲) وەرگرتن؛ ۳) بەرزەوەکـردن؛ ۴) زانینی وشەو پرسی گران ف ۱) نگهداشتن برای هنگـام نیاز؛ ۲) دریافت کردن، گرفتن؛ ۳) بلند کردن؛ ۴) دانستن و بلدبودن معمّا یا سؤال مشکل.

**هلاوارتن:** ۱) هەڵاواردن، لێك جیاکردنەوەی بێچوی ئاژەڵو دایکیان؛ ۲) هەڵـــوەژارتـن، ناپێویست‌و پێویست لێك جیاکـــرنـــەوە ف ۱) جداکردن مادران و بچەها در گله؛ ۲) جداکردن اشیاء لازم و غیرلازم.

**هلاوە:** زرّعاتی هاوینە، شیناوەرد ف کشت تابستانی.

**هلاویتـــن:** ۱) ئاو بەرەوژوُر فیچقـــەکـــردن؛ ۲) لێدانی دڵ: (دڵیّ من **هلاویت**) ف ۱) فوران؛ ۲) تپش قلب.

**هل‌براندن:** ۱) به تیخ لەخوارەوە بو سەرەوە قرتاندن؛ ۲) وەشوێن کەوتن بەغار بوّ گرتن؛ ۳) بڵندکردن ف ۱) با تیغ از پایین به بالا بریدن؛ ۲) به دنبال دویدن به قصد گرفتن؛ ۳) بلندکردن.

**هل‌برین:** هل‌براندن ف نگا: هل‌براندن.

**هل‌بژارتن:** هەڵبژاردن، نەقاندن ف انتخاب کردن، برگزیدن.

**هل‌بژارتی:** هەڵبژێراو ف برگزیده.

**هل‌بژێر:** کەسێ کە هەڵدەبژێرێ ف انتخاب کننده.

**هل‌بو:** هەستا ف برخاست.

**هل‌بوّرین:** ۱) جیاوەبوُن؛ ۲) بەجێ‌هێشتن؛ ۳) بەرەوسەرو تێ‌پەڕین ف ۱) جداشدن؛ ۲) جاگذاشتن؛ ۳) رو به‌بالا گذرکردن.

**هل‌بوهارتن:** ۱) هەڵاواردنی زا له ماك؛ ۲) شیری دایك له مناڵ بڕین، لەمەمك‌کردنەوە ف ۱) جداکردن بچەها از مادران در گله؛ ۲) بچەرا از شیرگرفتن.

**هل‌بوهوری:** ۱) هەڵاواردو؛ ۲) له شیری دایك بێ‌بەش کراو ف ۱) بچۀ از مادرجداشده؛ ۲) بچۀ از شیرگرفته شده.

**هل‌بەر:** ایجاد، ئاکام، حاسڵ: (میکروّب ژْ کرێتی‌یێ تێنه **هل‌بەرین**) ف تولید، محصول.

**هل‌بەرێن:** بەدی‌هێنەر، کەسێ کە بەرهەمێ دێنێتە حاسڵ ف تولیدکننده.

**هل‌بەرێنی:** کاری هل‌بەرێن ف تولیدکردن.

**هل‌بەزاندن:** هەڵبەزاندن ف جهانیدن.

**هل‌بەزین:** هەڵبەزین ف جهیدن.

**هل‌بەست:** شێعر، هوّنە، هەڵبەست ف شعر.

**هل‌بەستن:** ۱) شێعـردانـان، هوّنـەنـوُسین؛ ۲) دابـەستنی بەندو جوّ، بەربـەنـد قایم‌کردن؛ ۳) دەست‌و قاچی شکـاو لای شکستـەبـەنـد هەڵبەستنەوە ف ۱) شعر سرودن؛ ۲) سدّ بستن بر نهرو...؛ ۳) بستن استخوان شکستۀ اندام.

**هل‌بەستـــە:** قسـەی بێ‌بیستن له خوّوە گوتن، هەڵبـەستـە ف سخن ساختگی، دروغ.

**هل‌بەستی:** هەڵبەستراو، بەرکاری هل‌بەستن ف اسم مفعول از «هل بەستن».

**هل‌بەهین:** دەرپەڕین، بەپەلە دەرکەوتن ف با شتاب خارج شدن.

**هلپایش:** ۱) گریانی بەکوڵ؛ ۲) هەنیسك‌دان لەپاش گریان ف ۱) گریۀ شدید؛ ۲) تنفّس مقطّع پس از گریۀ زیاد.

**هل‌پڕژین:** بەچنگان پێ‌هەڵچوُن وەك هەڵچوُنی پشیلە بە داردا ف مانند گربه از جایی بالارفتن.

**هل‌پژکین:** پشمین، پژمین ف عطسه‌کردن.

**هل‌پشافتن:** پشافتن، هەڵپشاوتن ف فشردن و مچاله‌کردن.

**هل‌پشافتی:** هەڵپشاوتراو، پشافتی ف مچاله‌شده.

**هل‌پشکین:** پژمین ف عطسه‌کردن.

**هل‌پفاندن:** تەتەڵەکردنی دانەویڵە ف بوجاری کردن بنشن.

**هل‌پفاندی:** لەتەتەڵەدراو، هەڵتەکاو بە سینی‌و... ف بوجاری شده.

**هل‌پەرتاندن:** بزگوڕبزگوڕکردن ف تکه‌پاره کردن، پاره‌پاره کردن.

**هل‌پەرتاندی:** شڕووڕکراو ف پاره‌پاره‌شده.

**هل‌پەرشتن:** هل‌پەرکین ف نگا: هل‌پەرکین.

**هل‌پەرکین:** پێ‌هەڵچـوُن به دار یان دیوار یان شاخـدا ف بالارفتن از درخت یا دیوار.

**هل‌پەرین:** هل‌جنقین، هەڵبەزینەوە لەترسان ف ازجا پریدن در اثر ترس.

**هل‌پەڕین:** هەڵپەڕکێ‌کردن ف رقصیدن.

**هل‌پەکاندن:** ۱) قەڵش‌قەڵش بوُن؛ ۲) لەت‌لەت بوُن؛ ۳) بڕدران ف ۱) تَرکهای بسیار برداشتن؛ ۲) قطعه‌قطعه‌شدن؛ ۳) بریده‌شدن.

**هل‌پەکاندی:** ۱) قەڵش‌قەڵش‌بوُگ؛ ۲) لەت‌لەت‌کراو؛ ۳) بڕدراو ف ۱) تَرَك ترك شده؛ ۲) قطعه‌قطعه‌شده؛ ۳) بریده شده.

**هل‌پەکیا:** کاری ڕابردوی هل‌پەکاندن ف فعل ماضی «هل پەکاندن».

**هل‌پەنگرین:** هەڵتوّقین ف بیرون زدن قارچ مانند.

**هلپی:** هەنیسك ف نفس بریده بریده پس از گریه.

**هل پیّچاندن:** بادان و پیّچدان وه‌ك گوشینی جلكی ته‌ڕی تازه‌شۆراو ف پیچاندن و تاب دادن.

**هل پیّچاندی:** پیّچدراوی گوشراو به‌توندی ف تاب داده شده.

**هل جنقاندن:** راچه‌ناندن و هه‌ڵبه‌زاندنه‌وه له‌ترسان ف ترساندن و از جا پراندن.

**هل جنقاندی:** راچه‌ناو له‌ترسان ف ترسیده و از جا پریده.

**هل جنقین:** هه‌ڵبه‌زینه‌وه له‌ترسان ف ازجا پریدن در اثر ترس.

**هل چاندن:** له‌ترسان له‌رزاندن، ترساندنی زۆر ف بسیار ترساندن و به لرزه انداختن.

**هل چاندی:** له‌ترسان له‌رزیو، زۆر ترساو ف از فرط ترس لرزیدن.

**هلچایش:** ته‌نگه‌نه‌فه‌سی ف نفس تنگی.

**هل چناندن:** هل پیّچاندن ف نگا: هل پیّچاندن.

**هل چنین:** ۱) به‌سه‌ریه‌کا کۆماکردن؛ ۲) هه‌ڵمژین وه‌ك ئه‌وه‌ی مه‌ره‌که‌ف هه‌ڵده‌مژیّ ف ۱) بر روی هم انباشتن؛ ۲) جذب کردن و مکیدن تدریجی مایع.

**هل چۆ:** کۆنه‌شمه‌ك. که‌ونه‌جلك ف کهنه‌لباس.

**هل چوُن:** ۱) هه‌ڵچوُن وه‌ك شیر له‌سه‌ر ئاگر هه‌ڵده‌چیّ؛ ۲) پیّ هه‌ڵچوُن وه‌ك به دار و دیوار هه‌ڵده‌چیّ ف ۱) سررفتن مایع در حال جوش؛ ۲) بالارفتن از درخت و دیوار و....

**هلچ وهلچ:** دژوار هه‌ناسه‌دان ف سخت نفس کشیدن.

**هل چوُیی:** کاری هه‌ڵچوُن به هه‌موُماناوه ف ۱) سررفتگی مایع؛ ۲) صعود از بلندی.

**هل چه‌نی:** وه‌له‌رزه‌که‌وت له‌ترسان ف از ترس به لرزه افتاد.

**هل خستن:** ۱) په‌زمه‌نده‌کردن؛ ۲) هه‌ڵگرتن بۆ ڕۆژی خۆی ف ۱) پس‌اندازکردن؛ ۲) نگهداشتن برای روز مبادا.

**هل خستی:** ۱) په‌زمه‌نده‌کراو؛ ۲) هه‌ڵگیراو ف ۱) پس‌انداز شده؛ ۲) نگهداری شده برای روز مبادا.

**هل خوارن:** هه‌ڵمژین ف مکیدن.

**هل خواری:** مژاو، مژتراو ف مکیده‌شده.

**هلدان:** ۱) وه‌رگرتن به‌په‌له؛ ۲) هه‌ڵدانه‌قسه له‌پاش بیّده‌نگی؛ ۳) ئه‌ستاندنه‌وه: (تۆڵ **هلدا**، واتا: تۆڵه‌ی ساند)؛ ۴) بڵندکردن، به‌رزکردنه‌وه؛ ۵) لادانی سه‌رپۆش وه‌ك ڕوبه‌ندلادان؛ ۶) دانه‌وه‌ی چیّندراو بزانی چه‌که‌ره‌ی هه‌یه‌و ده‌ڕویّ؟ ف ۱) باشتاب تحویل گرفتن؛ ۲) ناگهان به حرف آمدن بعد از سکوت؛ ۳) بازپس گرفتن؛ ۴) بلندکردن؛ ۵) کنارزدن سرپوش؛ ۶) کندن زمین به منظور بازدیددانهٔ کاشته‌شده.

**هلدایی:** ۱) حاڵه‌تی به‌رکاری هلدان؛ ۲) به‌ره‌وژوُر هاویژراو؛ ۳) گه‌شه‌کردو؛ ۴) زرنگ و ئاکارپه‌سند ف ۱) صفت مفعولی «هلدان»؛ ۲) به‌بالاپرت شده؛ ۳) شکوفان؛ ۴) زرنگ و خوش اخلاق.

**هلدیّران:** ۱) هه‌ڵداشتن؛ ۲) بریتی له فڕیّدانی ماسك له ڕوی دوڕو: (رویّ وی **هلدیّرا**) ف ۱) نگا: هه‌ڵداشتن؛ ۲) کنایه از برداشتن نقاب تزویر از روی کسی.

**هلز:** ۱) هه‌ڵز؛ ۲) جۆریّ گه‌مه‌یه به میج ف ۱) نگا: هه‌ڵز؛ ۲) نوعی بازی با شتالنگ.

**هلْسـانـدن:** ویّران کردن، خاك به‌توُره‌که‌کیّشان، ته‌رت و تونا کردن ف ویران کردن، با خاك یکسان کردن.

**هلْست:** ۱) رابو، هه‌ڵستا سه‌رپیّ؛ ۲) له خه‌و وشیاربو، له خه‌وهه‌ستا؛ ۳) به‌ستی به گوریس، به‌ستی وه‌ك چۆك به‌ستنی وشتر ف ۱) به‌پاخاست؛ ۲) ازخواب برخاست؛ ۳) باریسمان بست.

**هلْستن:** ۱) به‌ستنه‌وه‌ی گوّلك و چیّل به گوریس؛ ۲) ئه‌ژنۆبه‌ستنی وشتر که نه‌توانیّ بڕوا ف ۱) با ریسمان بستن گوساله و گاو؛ ۲) بستن زانوی شتر.

**هلْستی:** ۱) به‌سراو، به‌ستیاگ؛ ۲) چۆك به‌ستراو ف ۱) به‌ریسمان بسته شده؛ ۲) شتر زانوبسته.

**هل شابوُن:** زۆر که‌یف‌خۆش و شادبوُن ف بسیار خوشحال بودن.

**هل شابوُیی:** شادومانی زۆر ف شادمانی بسیار.

**هل شاندن:** ۱) هه‌ڵوه‌شاندن؛ ۲) په‌یمان‌شکاندن ف ۱) ازهم جداکردن، گسلانیدن؛ ۲) پیمان شکستن.

**هلْشتن:** ۱) وازلی‌هیّنان؛ ۲) یاریده کردن ف ۱) دست برداشتن؛ ۲) کمك کردن.

**هلْشکه‌ت:** هه‌ڵقه‌ندرا ف کنده‌شد.

**هلْشکه‌تی:** هه‌ڵقه‌ندراو ف کنده‌شده.

**هلْشیان:** هه‌ڵوه‌شانه‌وه ف ازهم گسستن، انحلال.

**هلْشین:** هه‌ڵوه‌شانه‌وه، هه‌ڵوه‌شینه‌وه ف ازهم گسستن، انحلال.

**هلف:** ده‌سگیران، دۆستی ژن: (**هلفا** ویّ چو بۆ سه‌رو کیّفاو پیّ هات) ف نامزد، یار مؤنّث.

**هل فڕاندن:** هه‌ڵفڕاندن ف پرواز دادن.

**هل فڕین:** هه‌ڵفڕین ف پروازکردن.

**هل قتاندن:** دادڕاندن ف از بالا به پایین دریدن.

**هل قتی:** دادڕاو ف از بالا به پایین دریده شده.

**هل قه‌تاندن:** ۱) فڕیّدان؛ ۲) ده‌رخستن ف ۱) پرت کردن؛ ۲) بیرون انداختن.

**هل قه‌تایی:** ۱) فڕیّدراو؛ ۲) وه‌ده‌رنراو ف ۱) پرت شده، دورانداخته شده؛ ۲) بیرون رانده شده.

**هل قه‌تیا:** ۱) فڕیّدرا؛ ۲) وه‌ده‌رنرا ف ۱) پرت شد؛ ۲) بیرون رانده شد.

**هل قه‌تین:** ۱) فڕیّدراوی؛ ۲) وه‌ده‌رنراوی، ده‌رکراوی ف ۱) پرت شدگی؛ ۲) بیرون رانده‌شدگی.

**هلکـڕْن:** ۱) هه‌ڵکیّشان، هه‌ڵکه‌ندنی دار و نه‌مام؛ ۲) هه‌ڵکردنی قۆڵ و لنگ و داویّن و...؛ ۳) کیّلانی زه‌وی؛ ۴) له زه‌وی هه‌ڵگرتنه‌وه؛ ۵) شانه له‌سه‌ردان ف ۱) کندن درخت و نهال؛ ۲) بالازدن آستین ودامن و...؛ ۳) شخم زدن زمین؛ ۴) برداشتن از زمین؛ ۵) شانه‌برسرزدن.

**هلکری:** به‌رکاری هلکڕْن ف اسم مفعول از «هلکڕْن».

**هل کشـانـدن:** ۱) هه‌ڵکیّشانی نه‌مام و شه‌تڵ؛ ۲) ده‌رکیّشانی شمشیّر و خه‌نجه‌ر و...؛ ۳) ڕۆیشتن به‌ره‌وژوُر؛ ۴) نه‌فه‌س هه‌ڵکیّشان ف ۱)

کندن نهال و نشا؛ ۲) برکشیدن شمشیر و خنجر از نیام؛ ۳) روبه‌بالا رفتن؛ ۴) نفس کشیدن.

**هل کشین:** ۱) بەرەوژوُورچوُن؛ ۲) هەڵچوُن بە دارو بەردا ف ۱) به‌طرف بالا رفتن؛ ۲) از درخت و صخره بالارفتن.

**هل کوتاندن:** هەڵبەزین لەخۆشیان ف ازشادی جست و خیز کردن.

**هل کۆڵك:** هەرچی شتی پێ دەکوڵن، ئامرازی کوڵین ف ابزارکنده‌کاری.

**هل کومین:** هەڵەنگوتن، ڕەت‌بردن‌و کەوتن ف سکندری خوردن.

**هلکەتن:** هەڵکەوتن ف نگا: هەڵکەوتن.

**هلکەتی:** ۱) روداوی بەدەگمەن؛ ۲) بلیمەت ف ۱) اتّفاقی؛ ۲) نابغه.

**هلکەواشتن:** وردپشکنین ف با دقّت وارسی کردن.

**هلکەواشتی:** پشکناو ف وارسی شده.

**هل کەوشاندن:** ۱) شی کردنەوەو توێژینەوە؛ ۲) پشکنین ف ۱) تحقیق و پژوهش کردن؛ ۲) وارسی کردن، تفتیش.

**هل کەوشاندی:** رابردوی هل کەوشاندن ف ماضی «هل کەوشاندن».

**هل کێش:** ۱) فەخر، شانازی؛ ۲) کەسێ شەتڵ‌و نەمام هەڵدەکێشێ ف ۱) فخر، افتخار؛ ۲) کسی که نشا و نهال را برمی‌کشد.

**هل کێشان:** هەڵ کێشان ف نگا: هەڵ کێشان.

**هل کێشاندن:** دەرهێنان لە شوێنی خۆی ف خارج کردن و بیرون کشیدن.

**هل گاڤتن:** بڵندکردنەوە، بەرزکردنەوە، هەڵگرتن‌و لابردن ف برداشتن، بلندکردن.

**هل گرت:** رابردوی هل گرتن ف ماضی «هل گرتن».

**هل گرتن:** ۱) هەڵگرتنی بارو کۆڵ؛ ۲) هەڵگرتنی شت تا نرخی گران‌بێ؛ ۳) بەباوەشەوە گرتن؛ ۴) تاوتوێ پەیداکردنی برین؛ ۵) ژن‌هەڵگرتن، رفاندنی ژن؛ ۶) هەڵگرتن‌و بردنی شتێ بۆ خۆ ف ۱) برداشتن بار؛ ۲) احتکار؛ ۳) بغل کردن؛ ۴) باز به دردآمدن زخم؛ ۵) ربودن زن به قصد ازدواج؛ ۶) چیزی را برای خودبرداشتن، به خود اختصاص دادن.

**هل گرتی:** ۱) ژنی ڕفێنراو، هەڵگیراو؛ ۲) هەڵگیراو بۆ کاتی گرانی؛ ۳) باری هەڵگیراو؛ ۴) داندراو بۆ پاشەکەوت‌و لەناونەچوُن ف ۱) زن ربوده شده؛ ۲) احتکارشده؛ ۳) بارحمل شده؛ ۴) نگهداری شده برای پس‌انداز، پس‌اندازشده.

**هل گوڤاشتن:** ۱) هەڵگوشین بەتوندی‌و لەزەبر؛ ۲) زۆربۆهێنان، تەوژم‌دان ف ۱) با شدّت فشردن؛ ۲) فشار وارد کردن.

**هل گوڤاشتی:** ۱) هەڵگوشراو، توند شەتەك‌دراو؛ ۲) تەوژم‌دراو ف ۱) فشرده‌شده؛ ۲) تحت فشار.

**هل گوهاشتن:** گوشین بەتەوژم ف با شدّت فشردن.

**هل گەڕان:** ئاوەژوبوُنەوە، سەرنخوُن‌بوُن ف زیر وروشدن.

**هل گەڕاند:** نۆبەی کرد لە کێشك گری‌دا ف کشیك عوض کرد.

**هل گەڕاندن:** ۱) ئاوەژوکردن؛ ۲) گۆڕینی کێشکچی بە یەکی‌تر، نۆبەپێ کردن ف ۱) وارونه‌کردن؛ ۲) پاس عوض کردن.

**هل گەڕاندی:** ئاوەژوکراو ف وارونه‌شده.

**هللو:** حولی، لوُس لەدەستان، پێچەوانەی زبر ف صاف، مقابل زبر.

**هللۆ:** ئاڵوچە، عەلوکە ف آلوچه.

**هللوربللور:** حللوربللور. جۆرێ گەمەیە بۆ منالی بچوُکی دەکەن ف نوعی بازی بچّه‌گانه.

**هلله:** ناسازی، نەخۆشین ف بیماری.

**هلم:** ۱) بوخ، بوق؛ ۲) هەناسە ف ۱) بُخار؛ ۲) نفس.

**هلم‌دو:** شێ‌و تەڕایی زۆر ف نم و ترشّح.

**هل‌مشتن:** هەڵ کردنی قوڵ یان داوین، هەڵ‌ماڵین ف ورمالیدن آستین یا پاچهٔ شلوار.

**هل مشتی:** هەڵ‌ماڵدراو ف ورمالیده.

**هلم‌وگولم:** بوخارو بخور ف دود و بُخار.

**هلو:** ۱) رابە، راستەوەبە؛ ۲) لوُس، حولی، ساف‌و بێ گنج، دژی زبر ف ۱) برخیز؛ ۲) صاف.

**هلۆت:** ۱) نوقوستان؛ ۲) چاوەدرپەڕیو؛ ۳) گیائەسپوُن، کەفکەفوگ ف ۱) ناقص‌العضو؛ ۲) چشمان برجسته؛ ۳) گیاه چوبك.

**هلورا:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**هلورەشك:** ئاڵو بوخارا، هەڵوُچەڕەشە ف آلو بخارا.

**هلوُس:** ۱) لوُس‌و بێ گنج؛ ۲) نەرم‌و نیان ف ۱) صاف؛ ۲) نرم.

**هلۆل:** ناوبەتاڵ ف کاوك، توخالی.

**هلوُم:** دەم، تاو، ماوەیەکی کەم لە وەخت ف آن، لحظه.

**هلوەراندن:** ۱) دابارینی فرمێسك؛ ۲) وەرینی خەزەڵ ف ۱) ریختن اشك؛ ۲) ریزش برگ خزان.

**هلوەراندی:** ۱) داباریو؛ ۲) هەڵوەریو ف اسم مفعول از «هلوەراندن».

**هلوەشاندن:** هەڵوەشاندن ف نگا: هەڵوەشاندن.

**هلوەشیای:** هەڵوەشاو ف نگا: هەڵوەشاو.

**هلوەشین:** هەڵوەشان ف نگا: هەڵوەشان.

**هله:** ۱) وتەی ڕاوکەر بۆ دنەدانی توڵە کە بچێتە کونی نچیرەوە؛ ۲) هەڵێنانی‌دژوار ف ۱) کلمهٔ تحریك سگ شکاری تا به سوراخ نخجیر رود؛ ۲) به سختی بلندکردن.

**هلهاتن:** ۱) بارکران؛ ۲) دەرکەوتنی خۆرو هیڤ‌و ستێر لە عاسمان؛ ۳) پێگەیشتنی هەویرو هەرچی ئامیانی تێکراوە؛ ۴) بڵندبوُن؛ ۵) دیار ف ۱) حمل شدن؛ ۲) طلوع؛ ۳) ورآمدن خمیر و مانند آن؛ ۴) بلندشدن؛ ۵) پیدا، قابل رؤیت.

**هلهلوُك:** بەلاڵوکەکێویلە ف آلبالوی کوهی.

**هلهلەك:** بەری دارێکە وەك گوێژەزەردەی درشت دەچێ ف میوهٔ درختی است شبیه زالزالك.

**هلهول:** زۆر نەرم لەدەستان ف بسیارنرم.

**هلەهـ:** بڵندی، هل ف بلندی، سربالایی.

**هلەهتن:** بڵندبوُن ف بلندشدن.

**هلەیایش:** توانەوە ف ذوب شدن.

**هلی:** ۱) راست برۆ؛ ۲) راست ڕاوەستە ف ۱) مستقیم برو؛ ۲) راست

بایست.

**هلیٚ:** ١) بیٚڵه، لیٚی گەڕێ، وازی لیٚ بیٚنه؛ ٢) دەرکەویٚ. بۆ مانگ یان خۆر دەیڵیٚن: (عیدەو حەبیبیٚ نەزرە لیٚ/ یان دیٚ بقوربان بیٚ مەلیٚ/ یاڕەب ببینم ڕۆژ **هلیٚ**/ سککین ددەست قەسساب‌دا) «جزیری» [ف] ١) بهل، بگذار؛ ٢) طلوع کند.

**هلیا:** ١) بەجیٚی هیٚشت؛ ٢) وازی لیٚ هیٚنـا [ف] ١) بەجا گذاشت، ترکش کرد؛ ٢) دست از سرش برداشت.

**هلیان:** ١) گوم‌بوُن؛ ٢) لیٚ گەڕان، وازهـاوردن؛ ٣) بڵندکردن [ف] ١) گم شدن؛ ٢) هشتن، دست برداشتن؛ ٣) برداشتن.

**هلیاندن:** ١) گوم کردن، ونداکردن؛ ٢) وازلیٚ‌هاوردن؛ ٣) بڵندکردن [ف] ١) گم کردن؛ ٢) هشتن؛ ٣) برداشتن.

**هلین:** ١) لاگره، وەلا بەره؛ ٢) بڵندکه [ف] ١) برگیر، کنارزن؛ ٢) بردار.

**هڵیٚن:** دیٚو، دیٚوەزمە، پیرهەقۆك، جنۆکەی خەڵك‌ترسیٚن [ف] غول بیابانی.

**هم:** ١) ئاو، هاو، هام، وتـەی شەریکی؛ ٢) پیتی دنـەدان، هەیدیٚ [ف] ١) کلمهٔ شراکت، هم؛ ٢) کلمهٔ تشجیع.

**هما:** ١) وتەیەکه له جوابا دەگوترێ بەمانا بۆیه: (چماته ئەڤ کر؟ **هما**)؛ ٢) وابزانم: (**هما** ئەو تشت نەولۆیه)؛ ٣) هیٚمان، هیٚشتا؛ ٤) بەڵام؛ ٥) هەر ئەمـەسـه؛ ٦) ئەوسـاکـه؛ ٧) دەی‌پتـر؛ ٨) گریمان [ف] ١) کلمهٔ جواب، چرا؛ ٢) پندارم؛ ٣) هنوز؛ ٤) امّا؛ ٥) همین است؛ ٦) آنگاه؛ ٧) بازهم بیشتر؛ ٨) فرضاً.

**همار:** عەنبار، عەمار [ف] انبار.

**همانا:** بەهەڵکەوت [ف] بەندرت.

**هماهما:** بەڕاویٚژ، بەهرز [ف] بەنظر، بەتصوّر.

**همبان:** کیسەی له پیٚسته مەڕو بزن [ف] انبان.

**همبانه:** همبان [ف] انبان.

**همبز:** ١) ئامیٚز، هامبیٚز، باوەش؛ ٢) لیٚك‌هاڵاوی توند: (گیا **همبزه**)؛ ٣) پڕ چانـدن: (ته **همبز ئاڤیتی**) [ف] ١) آغوش؛ ٢) کاملاً درهم آمیخته؛ ٣) کشت انبوه، بذرپاشی انبوه.

**همبزئاڤیتن:** تۆم بەپڕی چاندن [ف] بذر انبوه پاشیدن.

**همبەر:** ١) بەرانبەر؛ ٢) روبەڕو [ف] ١) برابر؛ ٢) روبرو.

**همبیٚز:** ١) همبـز؛ ٢) هەتەر، مەودای گەیشتن: (**همبیٚزا** تفەنگیٚ) [ف] ١) آغوش؛ ٢) تیررس.

**هم‌ژی:** دەسەریەوەهیتر [ف] دیگر.

**همس:** بزنی سەرو ڕو پڕ له خاڵی سوُر [ف] بُزی که رخسارش خالهای قرمز دارد.

**هم‌گم:** ئاڵۆزو تیٚك‌هاڵاو [ف] سردرگم.

**هم‌هم:** مرقه، مرق: (هم‌همیٚ بەرازان) [ف] نگا: مرقه.

**همی:** رەپەڕەپی لیٚدان [ف] صدای کتك‌زدن.

**همیٚ:** ئومیٚد، ئاوات [ف] امید.

**همیٚز:** همبیٚز، هامیٚز، باوەش [ف] آغوش.

**همیٚلی:** حەمایەل، نوشتەی بە مناڵا هەڵواسراو [ف] دعای نوشته.

**همین:** ١) دەنگەدەنگ؛ ٢) گرمه [ف] ١) سروصدا؛ ٢) غرنبه.

**هن:** ١) ئیٚوه؛ ٢) کـەمیٚ، تۆزیٚ؛ ٣) ئەوەنـده؛ ٤) ئاوها [ف] ١) شما؛ ٢) کمی، اندکی؛ ٣) این قدر؛ ٤) چنین.

**هنا:** ١) هاوار؛ ٢) ئاوا، ئاوها؛ ٣) دەی پتر [ف] ١) فریاد، بانگ؛ ٢) چنین؛ ٣) بازهم بیشتر.

**هنار:** نار [ف] انار.

**هنارت:** ناردی [ف] فرستاد.

**هنارتن:** ناردن [ف] فرستادن.

**هنارتی:** نارداو، نیٚرداو [ف] فرستاده.

**هنارك:** سەرکوڵمه، سەرگۆنا [ف] روی گونه.

**هنـــاره:** وەڵام‌ناردن به هیٚمـــا، به ئاڵاو به ئاگر خەبـــەردان [ف] علامت فرستادن، اعلام خبر به وسیلهٔ آتش یا عَلَم.

**هناریٚ:** دارهەنار [ف] درخت انار.

**هنارین:** سوروەك، گوڵی هەنار [ف] گل انار.

**هناف:** دەروُن، ناوزگ [ف] درون، محتوای شکم.

**هناف‌چوُن:** زگچوُن، زگەشۆره [ف] اسهال.

**هناڤیشی:** هەرپتر، فیشتر [ف] بیشتر.

**هنان:** هیٚندیٚ کەس [ف] بعضی افراد.

**هن‌بهن:** وردەورده، کەم‌کەمه [ف] بەتدریج.

**هنتـــرش:** گیایەکی تام‌تیژه دەرمـانی زگ‌ئیٚشـەیه، هەندریٚشن [ف] گیاهی است تندمزه و دارویی.

**هنج:** وردکراو به تیغ [ف] با تیغ ریزریز شده.

**هنجاندن:** پاك‌کردنەوەی بیر له پڕو پوُش‌و ئاوی پیس [ف] پاکسازی چاه آب.

**هنجاندی:** بیری خاوێنەوەکریاو [ف] چاه پاکسازی شده.

**هنجـرانـدن:** ١) لەز لیٚ‌کردن، پەلـه لیٚ‌کردن؛ ٢) ونجـڕونجـڕ کردن، لەت‌وپەت کردن [ف] ١) عجله کردن؛ ٢) لت وپارکردن.

**هنجراندی:** ١) وپەلەخراو؛ ٢) لەت‌وپەت‌کراو [ف] ١) بەشتاب افتاده؛ ٢) لت‌وپارشده.

**هنجری:** هنجراندی، پارچەپارچەکراو، ونجڕونجڕکراو [ف] لت‌وپارشده.

**هنجگ:** پۆشاك، کنج [ف] لباس.

**هنجن:** وردکراو، ئەنجن، ئەنجناو [ف] با تیغ ریزریز شده.

**هنجناندن:** هەنجنین، وردکردن به چەقۆو تیخ [ف] با تیغ ریز ریز کردن.

**هنجنی:** هەنجناو، هنجن [ف] ریز ریزشده با تیغ.

**هنجنین:** ئەنجنین [ف] خردکردن با تیغ.

**هنجەت:** پەڵپ، بەهانه [ف] بهانه.

**هنج‌هنج:** وردوردکراو به تیغ [ف] ریزریزشده با تیغ.

**هنـد:** ١) ئەنـدازه؛ ٢) کەم؛ ٣) بەس، چیتر نا: (پەیڤا من **هنده** چی دن نابیٚژمـــه ته)؛ ٤) لا، ئالـی؛ ٥) له لای، له کن؛ ٦) بریٚتی له قەدرو حورمـەت‌گرتن: (به **هندم** ناگره) [ف] ١) اندازه، مقدار؛ ٢) اندك؛ ٣) کافی، بس؛ ٤) طرف، سو؛ ٥) نزد، پیش؛ ٦) کنایه از ارج و احترام.

**هنداف:** ١) دیمەن له لای سەروڕا: (هاته **هنداڤیٚ** گوند واتا: به ڕوکاری دیٚ‌دا هات له سەرەوه)؛ ٢) روبەڕو، بەرانبەر؛ ٣) لەپەنا، نزیك، کن [ف]

۱) منظره از بالا؛ ۲) برابر، روبه‌رو؛ ۳) در کنار، در نزد.

**هنداق:** هاوتا، لنگه ف همتا.

**هندرو:** ۱) ژوره‌وه‌ی ماڵ؛ ۲) ژوره‌وه ف ۱) اندرون خانه؛ ۲) تو، درون.

**هندك:** که‌م، کێم، پێچه‌وانه‌ی زیاد ف کم، اندك.

**هندكاندن:** که‌م‌کردنه‌وه ف کم کردن.

**هندكاندی:** که‌م‌کراوه‌وه ف کم شده.

**هندكایی:** که‌میه‌تی ف کمی.

**هندكه:** که‌مه، زیاد نیه ف کم است.

**هندكه‌ك:** که‌مێك، تۆزێك، نیسکێك ف اندکی.

**هندكی:** هندكایی ف کمی.

**هندوبا:** گیایه‌كی خۆراكی‌یه‌و له چێشتی ده‌كه‌ن ف کاسنی.

**هندور:** ۱) هندرو؛ ۲) ده‌روونی له‌ش ف ۱) اندرون خانه؛ ۲) درون بدن.

**هندوربین:** مرۆی زۆر تێگه‌یشتو ف آدم بسیار عاقل.

**هندوك:** بسكویت، گه‌رگه‌ری ف بیسکویت.

**هندوی:** جۆرێ ترێ ف نوعی انگور.

**هنده:** هه‌ڤقاس، ئه‌وه‌نده ف اینقدر.

**هنده‌ق:** روبه‌ڕو، له ڕوی یه‌كتردا ف مقابل.

**هنده‌كۆ:** شه‌وده‌ر، عاره‌ب كردویه‌ته حه‌نده‌قوقی ف گیاه شبدر.

**هنده‌كی:** كه‌مایه‌تی ف کمی.

**هندی:** ۱) ئه‌وه‌ندی: (هندی من كر و نه‌كر ئه‌نه‌گه‌ڕیا)؛ ۲) خه‌ڵكی ولاتی هند ف ۱) هرچقدر؛ ۲) هندی.

**هندیكو:** ئه‌وه‌ند، چه‌ند به چه‌ند ف هرچند.

**هنر:** هونه‌ر، هنه‌ر ف هنر.

**هنزار:** هه‌زار ف هزار.

**هنزار و یه‌و:** هه‌زار و یه‌ك ف هزارویك.

**هنف:** به‌ژن‌باریكی له‌بار ف کمر باریك و خوش اندام.

**هنك:** هندك، كه‌م ف کم.

**هنكوف:** ۱) هاوكوف، شیاوی یه‌كتر؛ ۲) به‌رانبه‌ر له وه‌زنا ف ۱) هم‌شأن؛ ۲) هم وزن.

**هن كه‌رۆش:** دروستی كرد ف درست کرد.

**هنـگ:** ۱) ئێوه، هن، ئه‌نگـو؛ ۲) فن، ده‌نگی لوتی چڵمن؛ ۳) هه‌نگ، مێشه‌نگوین؛ ۴) ده‌نگی پێكه‌نین، حیلكه؛ ۵) جه‌نگه، كات، وه‌خت ف ۱) شما؛ ۲) فین، صدای بینی؛ ۳) زنبور عسل؛ ۴) صدای خنده؛ ۵) موسم، عُنفوان.

**هنگا:** ئه‌ودەم، ئه‌وسا ف آنگاه.

**هنگاف:** گاف، شه‌قاو ف گام.

**هنگاڤتن:** ئه‌نگاوتن، پێكان ف به‌هدف زدن.

**هنگاڤی:** دنیابو وابو، جارێك له جاران، له سه‌رده‌مێكا ئه‌گه‌ر ف احیاناً.

**هنگاو:** هنگاف، شه‌قاو، گاو ف گام.

**هنگایش:** حیلكه‌پێكه‌نین، قاقالێدان ف قاه‌قاه خندیدن.

**هنگرتن:** راكردن، له زه‌وی بڵندكردن ف برداشتن.

**هنگست:** ئه‌نگوست، ئه‌موست، تلی، تلهی، قامك، په‌نجه، تبل ف انگشت.

**هنگستو:** قوچه‌كه، ئه‌نگوستیله‌ی دورمانان ف انگشتانه.

**هنگڤ:** به‌هره‌و حاسڵی شیرینی مێشه‌نگوین ف عسل.

**هنگڤاندن:** ۱) هنگڤ‌چێكرنی هه‌نگ؛ ۲) برێتی له قسه‌ی خۆش و كاری دڵخۆشكه‌ر ف ۱) تولید عسـل توسط زنبـور؛ ۲) كنـایه از سخن شیرین و كار خوشایند.

**هنگڤتن:** ئه‌نگاوتن، له نیشان و ئارمانج دان ف به‌هدف زدن.

**هنگڤین:** هنگڤ ف عسل.

**هنگڤینۆ:** گیایه‌كه به‌ره‌كه‌ی شیرینه ف گیاهی است.

**هنگـل:** ۱) ده‌سكی گۆزه‌و دیزه؛ ۲) سنـگ یان گوڵمیخێ ئاژه‌ڵی پێ ده‌به‌ستنه‌وه؛ ۳) پێسته‌ی ئاژه‌ڵ به بێ كه‌م‌بونی جه‌رمی باكانی، خێگه؛ ۴) هه‌رشتێكی چوار هه‌نگڵی بێ، ئه‌وه‌ی چوار پێی بێ‌و بگروێ ف ۱) دستهٔ سبو؛ ۲) میخ طویله؛ ۳) خیك، پوست قالبی كندهٔ حیوان؛ ۴) هرچیزی كه چهاردستگیره یا چهارپا داشته و پوستش قالبی كنده شده باشد.

**هنگ‌لنگ:** هه‌نگڵه‌شه‌له ف لی‌لی.

**هنگله:** پیل، شان ف شانه، كتف.

**هنگلیسك:** ئه‌نگوستیله ف انگشتری.

**هنگمێن:** هه‌نگوین ف عسل.

**هنگو:** ئه‌نگۆ، ئێوه ف شما.

**هنگۆ:** هنگو، ئێوه، ئه‌نگۆ، وه ف شما.

**هنگور:** ترێ، هه‌نگور ف انگور.

**هنگۆر:** ئه‌نگۆره، ئێواره‌ی دره‌نگ ف عصر نزدیك غروب.

**هنگوری:** ئه‌نگۆره، هنگۆر ف نگا: هنگۆر.

**هنگۆری:** هنگۆر ف نگا: هنگۆر.

**هنگوست:** ئه‌نگوست، تبل، قامك ف انگشت.

**هنگوستوك:** ئه‌نگوستیله‌ی دورمانان ف انگشتانه.

**هنگوستیل:** ئه‌نگوستیله ف انگشتری.

**هنگوستیلك:** هنگوستیل ف انگشتری.

**هنگوڤ:** هه‌نگڤ، هه‌نگوین. لیكاوی پوخته‌كراوی هه‌نگ، هنگڤ ف عسل.

**هنگوڤین:** له چه‌شنی هه‌نگوین له چێژه‌و ڕه‌نگدا ف شبیه‌عسل.

**هنگولیسك:** هنگوستیل ف انگشتری.

**هنگـوونـگ:** ۱) شكـۆ و ده‌بـده‌بـه؛ ۲) خۆجـوان‌كردو: (مـرۆڤـه‌كی بهنگ‌وونگه) ف ۱) شكوه و دبدبه؛ ۲) خودآراسته.

**هنگه‌ریر:** هه‌نگور، ئه‌نگور، ترێ، تری ف انگور.

**هنگ‌هنگ:** حیلكه‌حیلك، قاقا ف قهقهه.

**هنگ‌هنگ‌هوایش:** قاقا پێكه‌نین ف قهقهه‌زدن.

**هنگی:** ۱) ئه‌وه‌نـدی؛ ۲) ئه‌وسـا، ئه‌ودەم؛ ۳) گش، ته‌واو، تێكـڕا؛ ۴) حیلكه، قاقا ف ۱) هرچند؛ ۲) آنگاه؛ ۳) همگی؛ ۴) قهقهه.

**هنگین:** ئه‌وسا، ئه‌ودەم، ئه‌وكاته ف آنزمان. آنگاه.

**هنۆهنۆ:** كه‌مه‌كه‌مه ف به‌تدریج.

**هنه:** خەنە، گیایەکە گەڵای بۆ ڕەنگ‌کردنی دەست‌و پەنجەو سەری ژنان بەکاردێنن‌و دەرمانیشە ف حنا.

**هنەترك:** شتێکی سپیە لەسەر هێندێك بەرد کە هەڵی دەقەنن‌و دەیکوڵێنن شتێکی لیچقی لێ پەیدادەبێ لەجیاتی خەنە دەکاری دێنن ف مادّه‌ای است که به جای حنا مصرف می‌شود.

**هنـەر:** ١) جونەر؛ ٢) گزی؛ ٣) ئاکاری باش؛ ٤) پیشەو سنعات ف ١) هنر؛ ٢) نیرنگ؛ ٣) رفتار نیکو؛ ٤) صنعت.

**هنەرباز:** کەسێ کاری ژانان لەسەر شانۆ دەکا ف هنرپیشه.

**هنەربازی:** کاری هنەرباز ف هنرپیشگی.

**هنەرگە:** فێرگەی هنەر ف هنرستان.

**هنەرمەند:** دەس‌ڕەنگین، بەجونەر ف هنرمند.

**هنەروەر:** هنەرمەند ف هنرمند.

**هنەروەری:** هنەرزانین ف هنرمندی.

**هنەری:** ١) هنەرمەند؛ ٢) پیشەساز ف ١) هنرمند؛ ٢) صنعتگر.

**هنەك:** ١) کەمێك؛ ٢) بازێك، بەشێ، برێ لە خەڵك ف ١) اندکی؛ ٢) بعضی.

**هنەکی:** کەمایەتی، کەمی ف کمی.

**هنی:** ١) پیاساوی، پیامالی؛ ٢) ئاوها، بەم‌جۆرە؛ ٣) ئەمە ف ١) مالید، اندود؛ ٢) چنین؛ ٣) این.

**هنیکـۆ:** ١) ئیتر هەر ئەمەیە؛ ٢) وا لێرەیە ف ١) دیگر همین است؛ ٢) اینك در اینجا است.

**هنین:** پیاساوین ف اندودن.

**هنی‌یۆ:** ١) هنیکۆ؛ ٢) ئا بەم‌جۆرە ف ١) نگا: هنیکۆ؛ ٢) اینچنین.

**هو:** ١) خەنە، کەن؛ ٢) خۆی، خۆ ف ١) خنده؛ ٢) خود.

**هۆ:** ١) سەبـــەب، سۆنگـــە؛ ٢) هەمێ، ئومێد؛ ٣) جواب لەبـاتی بەڵێ: (حـــەســـــەن؟ هۆ)؛ ٤) وتـــەی جوتـیار لە جوتدا بۆ لێخـــوڕین‌و وەرسـوڕانـدنی گاجـوت؛ ٥) وتـەی پارازتن لە شتێ: (هۆ پێت ئەڵێم نەچی)؛ ٦) بڵند، هل؛ ٧) تێ‌هەڵێنانەوە، قەرەبوکردنەوە: (زەرەرم کردبو بەڵام ئەم‌جارە هۆی دایەوە)؛ ٨) کاری باش کردن: (ئـــافـــەریم هۆت‌دایەوە)؛ ٩) فایدە: (بـــێ‌هۆیە بەلایەوە ناچـــم)؛ ١٠) وتـــەی بانـگ‌کردن لەدوورەوە؛ ١١) زۆر، فرە: (مـرۆیەکە هۆزانە)؛ ١٢) خوو، عادەت: (هـۆگر بوە)؛ ١٣) ئاوهـا؛ ١٤) دەرفەت، هەل: (هۆیەو هەر ئەمـرۆیە) ف ١) انگیزه، سبب؛ ٢) اُمید؛ ٣) بلی؛ ٤) کلمـهٔ راندن و برگرداندن گاو هنگام شخم زدن؛ ٥) کلمهٔ تحذیر، هان؛ ٦) بلند؛ ٧) جبـران کردن؛ ٨) شاهکـارکردن؛ ٩) بهره، فایده؛ ١٠) حرف ندای دور؛ ١١) بسیار، زیاد؛ ١٢) اُنس، عادت؛ ١٣) این طور؛ ١٤) فرصت.

**هوُ:** ١) وتەیەکی دەروێشانەیە واتا: خوا؛ ٢) نیشانەی زرنگی‌و هوربینی: (هـوُ لە موُ جیادە کـاتـەوە)؛ ٣) بێ‌نرخ‌و هیچ؛ ٤) قازانج، سوُد؛ ٥) پف‌کردن بۆ گەرم‌کردنـەوە ف ١) تکیه‌کلام درویشان، هو؛ ٢) نشانهٔ زرنگی و موشکافی؛ ٣) پوچ و بی‌ارزش؛ ٤) سود؛ ٥) پُف کردن برای ایجاد گرما.

**هواتەیش:** کەن، خەنین ف خنده.

**هوایش:** پێکەنین ف خندیدن.

**هۆب:** ئۆبە، جێگەی کۆمەڵەچادرێ پێکەوە ف اوبه، محلّ برپایی چندچادر.

**هۆبـڕان:** نائـومێدبـوُن لە کارێ یان کەسێ: (لـەم کوڕەم هۆبڕاوم) ف مأیوس شدن.

**هۆبو:** ئاوها بو، بەم‌جۆرە بو ف چنین بود.

**هۆبە:** هۆب، ئۆبە ف نگا: هۆب.

**هۆبـێ:** ١) جۆرێ لە تیرەی مارمێلکـــە؛ ٢) دەگەڵ تۆمـــە وەرە ف ١) چلپاسه، نوعی مارمولك؛ ٢) آهای بیا.

**هۆپ:** ١) وتەی پەسندکردن؛ ٢) وتەی دەنگدانی وشتر؛ ٣) وتەی گاڵتـەکـردن بە کەسێ کە بای لێ‌دەبێتـەوە ف ١) آفرین؛ ٢) حرف آگاهی دادن به شتر؛ ٣) کلمهٔ تمسخر نسبت به کسی که بادی از او خارج شود.

**هوپال:** جۆرێ کەموتەری دەشت ف نوعی کبوتر.

**هۆپیالا:** لاوی نازنازو خاوو‌خلیسك ف جوان نازنازی و خام.

**هۆپیەلا:** هۆپیالا ف نگا: هۆپیالا.

**هۆپ کرن:** بازدان لە بڵندەوە ف ازبلندی پریدن.

**هۆپل:** لاواز، لەجەر ف لاغر.

**هۆپەڵ:** تۆپەڵ، تۆپەڵەقوڕ، تۆپەڵەبەفر ف گلوله از گل یا برف.

**هۆپەلان:** شەڕە تۆپەبەفر و قوڕ ف گلوله برف و گل را به سوی هم پرت کردن، برف‌بازی.

**هۆپ‌هۆپ:** وتەی دنەدانی وشتر بۆ ڕۆیشتن ف کلمهٔ تشویق شتر به رفتن.

**هوت:** شە، شێ، ڕتوُبەت، تەڕایی، تەڕی ف نم، رطوبت.

**هۆت:** حەفت، حەوت، هەوت ف هفت.

**هوُت:** ١) خەوت، نقُست، نوست؛ ٢) خۆهـــەڵکێشـان بەدرۆ: (هـات‌و هوُت)؛ ٣) خـەو؛ ٤) فێر، راهـات، هەقـــوُت، هیـن، هوُین؛ ٥) خۆش‌چێژە؛ ٦) شەیتان، گیانی بەدفەڕ؛ ٧) شە، تەڕایی ف ١) خفت، بەخواب رفت؛ ٢) لاف مفت؛ ٣) خواب؛ ٤) تعلیم؛ ٥) لذّت؛ ٦) روح شریر؛ ٧) نم، رطوبت.

**هوُت‌بوُن:** ١) فێر بوُن، هین‌بوُن، هەقوُتن؛ ٢) بە شوێنێك فێر بوُن ف ١) یادگرفتن؛ ٢) عادت بەرفتن جایی کردن، به چیزی معتاد شدن.

**هوُت‌ئانتش:** شەکێشان، ڕتوُبەت لێدان ف نم کشیدن.

**هوُتك:** نوُك‌تیژی سواو بە هەسان‌و بەردەزوُرە ف نوك تیزشده به وسیلهٔ سوهان.

**هوُت‌کرن:** پێ‌فێربوُن، هوُت‌بوُن ف عادت به چیزی داشتن، نگا: هوُت‌بوُن.

**هوتن:** شەدار ف نمدار، مرطوب.

**هوُتو:** گەلایی، گوێ‌نەدەر بە هیچ ف بی‌توجه به مسائل، لاابالی.

**هوُتە:** ١) خەو؛ ٢) خەفتگە، نوستوە ف ١) خواب؛ ٢) خوابیده است.

**هوُتەر:** چوڵەچرا، خەتیرە ف مشعل نیمسوز.

**هوُتەن:** خەوتوە ف خوابیده است.

**هوجره:** ۱) شوێنی تایبەتی بازرگانی گەورەی کۆفرۆش؛ ۲) کلاسی خوێندنی فەقێیان کە لێشی دەخەون ف ۱) حجرهٔ بازرگانان؛ ۲) خوابگاه و کلاس درس طلبه.

**هۆجەنە:** دۆخین، دێخوُن ف بند شلوار.

**هۆجەنەکێش:** داردۆخین، داروکەیە سەرێکی کون کراوە دۆخینی پێ لە دەرپێ دەکێشن ف چوبکی سوراخ‌دار که به وسیلهٔ آن بند را به نیفه کشند.

**هۆچ:** بابۆڵە، تیکەی پێخۆر تێوەپێچراو ف ساندویچ.

**هوُچك:** ۱) ئەنگوچك؛ ۲) خوارەوەی داوێن؛ ۳) قۆڵی کراس؛ ۴) نوچك، چلان ف ۱) آستین بلند؛ ۲) پایین دامن؛ ۳) آستین پیراهن ۴) نگا: نوچك.

**هۆچنە:** هوجەنە، دۆخین ف بند تنبان.

**هۆخ:** ۱) بەش، پاژ، بەهر، پشك، بێش؛ ۲) هەردی تەواو کێڵدراو؛ ۳) خۆخە، درگای پچوُك لە ناو دەروازەدا ف ۱) سهم، حصّه؛ ۲) زمین به طور کامل شخم شده؛ ۳) در ورودی کوچك در میان دروازه.

**هوُد:** ۱) حوکم، زاکوُن، زەبر و زەنگ لە حوکم کردنا؛ ۲) هیر باری لە سواڵەت؛ ۳) دەفری پەل لە سواڵەت، گلێنەی پەل؛ ۴) جانەوەری دوتۆمە، دوورە؛ ۵) شکاو؛ ۶) شکاوی ف ۱) حکم، قاطعیّت در فرمانروایی؛ ۲) ظرف سفالین؛ ۳) بشقاب سفالی؛ ۴) حیوان دورگه؛ ۵) شکسته؛ ۶) شکستگی.

**هۆدا:** ۱) نۆدا، دایك؛ ۲) بانگ لە دایك کرن ف ۱) مادر؛ ۲) کلمهٔ خطاب به مادر.

**هۆداخ:** پنجی دەموُکانە ف بوُتهٔ مویزك.

**هۆدار:** دەموُکانەی کولێندراو کە ڕاوی مەلی پێ دەکەن ف مویزك عسلی.

**هۆدانەوە:** بارەپێ گەیاندن‌و تۆڵەکردنەوەی زیان‌و تەمەڵی ف تلافی کردن.

**هۆدڕە:** مێشوُلەی دندوكدرێژ کە دەبێتە هۆی تاو لەرز ف پشهٔ مالاریا.

**هۆدە:** ۱) ژوُری ماڵ؛ ۲) لەوێوە، هێمایە بۆ دوُر ف ۱) اتاق؛ ۲) از آنجا.

**هودەرە:** چێرگ، چرگ، مێشەسی ف هوبره.

**هۆدەنگ:** بانەشان، بان کردن، وتەی گازی کرن ف حرف ندا.

**هوڕ:** ۱) گێژ، تاساو؛ ۲) وڕبوُن، تاسان؛ ۳) ئەستوُر: (مل هوڕ)؛ ۴) قوڕ، حەڕی؛ ۵) جەواڵی زلی یەکتایی؛ ۶) خوڕەی ناو ف ۱) گیج و منگ؛ ۲) گیج شدن؛ ۳) کلفت؛ ۴) گِل؛ ۵) جوال بزرگ؛ ۶) صدای جریان آب.

**هۆر:** ۱) خۆر، ڕۆژی لەعاسمان؛ ۲) هەر، پێکەوە. *ئەتیا دەگەڵ دو دەگوترێ*: (هۆردو، واتا: دو پێکەوە)؛ ۳) هل، بەرەو بڵند بردن، هەڵدانەوە: (ڕۆژێ جە ناکاو جە سوب سەحەردا/ پەنجەرەی ئەیوان مەشریقیش هۆردا/ هەوادا پەردەی ڕوی سەفحەی جەبین/ خێزیا واوەیلای گرۆی موزنیبین) «مەولەوی»؛ ۴) پێ، وێ، ئایسان: (هۆر گرتای)؛ ۵) عەور، هەور ف ۱) خورشید؛ ۲) هر؛ ۳) بلندکردن؛ ۴) برافروختگی؛ ۵) ابر.

**هۆڕ:** ۱) ئاغەڵ؛ ۲) جەواڵی زۆر گەورەی یەکتایی؛ ۳) دەنگی زلی گاو چیڵ لە تاوی شتێ: (مانگا هۆڕەهۆڕیانە دیارە برسین)، بوُڕە؛ ۴) بای بە تۆزو مژەوە، وڕە؛ ۵) زەوینی زۆر نەرم کە سوار لێی دەرناچێ؛ ۶) مرۆی بیچم سەیرو سەمەرە ف ۱) آغل؛ ۲) جوال جانخانی؛ ۳) صدای بلند گاو؛ ۴) باد همراه با گردوغبار؛ ۵) زمین بسیار نرم؛ ۶) آدم عجیب‌الخلقه.

**هوُر:** ۱) ورد؛ ۲) ورگ، عوُر ف ۱) ریز؛ ۲) معده.

**هوڕا:** وڕا، دەنگی کۆمەڵ بۆ ئافەرین لە کەسێ، بژی ف هورای تشویق.

**هۆرا:** لەخۆیدا، زاتەن ف اساساً، ذاتاً.

**هۆراسان:** ۱) خاوەر، ڕۆژهەڵات، لایێ کە خۆری لێوە تێ، وادیارە خۆراسان هەر بەمانا ڕۆژهەڵاتە؛ ۲) ترساو، ترس لەدڵ؛ ۳) وەڕەز، جاڕز ف ۱) مشرق، خاور؛ ۲) ترسیده، هراسان؛ ۳) پکر.

**هوراك:** تەمشۆی دارتاشین، تەپشۆ، تەشوێ ف تیشه.

**هۆرامان:** ۱) زەردە کەوتن؛ ۲) خاوەر ف ۱) طلوع آفتاب؛ ۲) مشرق.

**هوُراندن:** ۱) تۆژینەوە، کۆڵینەوە، بەوردی بیرلێ کردنەوە؛ ۲) چکۆڵەکردنی زەلام ف ۱) پژوهش؛ ۲) کوچك‌تر کردن.

**هۆڕاو:** گۆلی گەورە، ئەستێری زل ف استخر بزرگ.

**هۆراوا:** ۱) خۆراوا، خۆرنشین؛ ۲) وڵاتی خۆرنشین ف ۱) غروب؛ ۲) مغرب.

**هۆڕاوە:** وڕاوە، پاتەران، وڕێنە ف هذیان.

**هورباندن:** گۆرانی گوتن بە سەبروکە، ویرەویر ف زمزمه، آواز زیرلبی.

**هوُربژار:** ئاڵەبێژ ف بیختن با پارچه.

**هوُربژارکرن:** ئاڵەبێژکردن، بە هێڵەگی زۆر کون‌ورد یان بە پارچەقوماشێکی هەڵە دابێژتن ف با پارچه یا الكِ ریز غربال کردن، بیختن.

**هوڕبوُن:** تاسان، گێژبوُن، وڕبوُن ف گیج و منگ شدن.

**هوُربوُن:** ۱) وردبوُن؛ ۲) نەرم‌بوُن ف ۱) خردشدن؛ ۲) نرم شدن.

**هۆربەشان:** تاوهەڵات، دەمی تاوکەوتن ف زمان طلوع خورشید.

**هۆربەشیان:** هۆربەشان ف زمان طلوع خورشید.

**هوُربوُنەوە:** لێ‌وردبوُنەوە، بەوردی لێ‌ڕوانین، باش هۆش‌دانەسەر ف دقّت کردن.

**هوُربین:** ۱) وردبوُن؛ ۲) وردبین ف ۱) خردشدن؛ ۲) ریزبین، میکروسکوپ.

**هۆرپە:** گلۆڵە لە خوری، کلو ف گلولهٔ پشمی.

**هۆرپاتە:** ۱) پەرتاوتە؛ ۲) قەیچی‌بڕ ف ۱) هَرَس شده؛ ۲) بریده با قیچی.

**هورپەهورپ:** هەراو هوریا، چەقەو گوڕە ف سروصدا، همهمه و جنجال.

**هۆرتك:** زارۆی ساوای ناحەزو دزێو ف نوزاد بدترکیب و زشت.

**هۆرتمە:** دەربیجە، درگای بچوك لە خانوی لادێ بۆ لێ‌ڕوانین ف دریچه، پنجرهٔ کوچك.

**هۆرتومان:** کزن ف گاودانه، کرسنه.

**هۆرتە:** ۱) وەرتە، مافوُرەی گەورە؛ ۲) وتەی جوتیار بۆ خەت

ڕاست کردنەوە؛ ٣) دامو دەستوورى ناو خەڵك؛ ٤) هاوردە، داهات ف ١) قالي بزرگ؛ ٢) کلمـهٔ بەراه آوردن گاو در شخم‌زنی؛ ٣) رسم و عادت؛ ٤) درآمد.

**هۆرتەکنای:** هەڵتەکاندن، تەتەڵەکردن ف بوجاری کردن.

**هۆرتـەوبـەرە:** ١) داب، دامو دەستوور؛ ٢) داهاتو خەرج: (هێشتا دە هۆرتەوبەرەی خۆم ناگەم) ف ١) رسم و عادت؛ ٢) درآمد و هزینه.

**هورچ:** ١) حەش، ورچ، ٢) بریتی لە نەزانو گێل ف ١) خرس؛ ٢) کنایه از نفهم، هالو.

**هورد:** ورد، هوُر ف خرد، ریز.

**هۆرد:** ورد، هور ف خرد، ریز.

**هۆردا:** ١) وردا، ڤردا؛ ٢) ڤێدا؛ ٣) بەرەژووری برد ف ١) از اینجا؛ ٢) از آنجا؛ ٣) بالا برد.

**هۆردادیانەوە:** بەرەوباڵا بردن، بۆ پەنجەرەو پەردەی دەڵێن ف بالازدن پرده و پنجره.

**هۆردادیاوە:** بەرەو باڵا چو، هەڵدرایەوە: (پەردەی سیاماڵ **هۆردادیاوە**/ چو ن مانگ نە گۆشەی ئەبری سیاوە) «مەولەوی» ف بالا زده شد.

**هۆردار:** فاقە، جۆرێ تەڵە ف نوعی تله.

**هوُردار:** مرۆی بێ‌نرخو کەم‌بایی ف حقیر.

**هۆرداشتن:** بەرەو بەرز بردن، هەڵماڵین ف ورمالیدن، بالازدن.

**هۆردان:** ١) بۆ باڵا بردن؛ ٢) بەرپـاکـردنی چادر ف ١) بالازدن؛ ٢) برپاکردن خیمه.

**هۆردای:** هەڵدان ف روبه بالا انداختن.

**هۆردڕون:** بەرەو ژوور دڕاندن ف وردریدن.

**هۆردز:** سیرمەخۆر، دزی خوێڕی ف دَلەدزد.

**هۆردو:** ١) دوان پێکەوە، هەردوك؛ ٢) لەشکر، سپا، ئۆردو ف ١) هردو؛ ٢) اردو، قشون.

**هۆردوبەز:** ١) ئۆردو بەز، بنکەی سانەوەی سپا؛ ٢) دابەزینی لەشکر لە شوێنێ ف ١) جای اُتراق سپاه در راه؛ ٢) اُتراق سپاه در جایی.

**هۆردوك:** بەجوتە، دوان پێکەوە، هۆردو ف هردوی آنها.

**هۆردوکیان:** هۆردوك ف هردوی آنها.

**هۆردە:** شێوی تراوی دانەوێڵە، شلە ف آش آبکی حبوبات.

**هوردەفرۆش:** خوردەفرۆش، وەردەفرۆش ف خرده‌فروش.

**هوردەك:** پیتـی ورد لە خەتی لاتین‌دا، بەرانبـەری گردەك ف حروف کوچك در خط لاتین.

**هوُردەم:** پاژێك لە شێست‌پاژی سەحاتێك، خولەك، دەقیقە ف دقیقه.

**هوردەمێنیا:** هەردوکیان ف هردوی آنها.

**هوردەنی:** هەردوك ف هردو.

**هوردی:** هەردوك، هەرتك ف هردو.

**هوردینە:** هەردوك ف هردو.

**هوڕە:** ١) وڕە، پەمۆی وەکری، بەحەلاجی کراو؛ ٢) مژوڕەشەبای سارد: (ئەمڕۆ هوڕەیە لە سەران) ف ١) پنبهٔ حلّاجی شده؛ ٢) باد سرد و مه با هم.

**هۆرز:** هرزا، جۆرێ هەڵپـەڕکێی کوردان کە ڕەشبەڵەکەو دەبنە کۆز ف نوعی رقص دسته‌جمعی.

**هورزای:** رابوُن، چوُنە سەرپا ف پاشدن، برخاستن.

**هوُرش:** ١) بڵندکردن، بەرەژوور بردن؛ ٢) خورڕەی ئاو ف ١) برداشت؛ ٢) صدای جریان آب.

**هوُرش گرتن:** بەرەژوور بڵندکردن، هەڵگرتن ف برداشتن، بلندکردن.

**هورشە:** هاشە، هاژە ف نگا: هاشه.

**هورشەهورش:** هورشەی زۆر ف «هورشه»های پیاپی.

**هورفی:** خەرفاو، خورفی ف خِرف.

**هۆرڤە:** لە هۆوەڕا، هێمایە بۆ دوور ف از آنجا.

**هوُرك:** ١) وردەی شتێ؛ ٢) ورد. بۆ تەقەڵی دەڵێن : (کراسێ تە مەگروُمە **هوُرك هوُرك** درومە)؛ ٣) جانەوەرێ کە بە چاو نابیندرێ ف ١) خرده؛ ٢) بخیه‌های ریز؛ ٣) میکروب.

**هوُرك‌بین:** زەڕەبین ف ذرّه‌بین.

**هۆرکریان:** ئایساندن، پێ‌کردن، داگیرساندن ف افروختن.

**هوُرکە:** ١) بروُشی ورد، پیرخەنیلە؛ ٢) خاکەی قەندو دار؛ ٣) ورتکەنان؛ ٤) وردی کە، وردی کەوە: (ڤێ پەرەی بۆ من **هوُرکە**) ف ١) بلغور ریز؛ ٢) خاکهٔ قند و چوب؛ ٣) ریزه‌نان؛ ٤) خردش کن.

**هوُرکەنان:** ورتکەنان، وردەو پردەی نان ف ریزه‌نان.

**هۆرکەوت:** بەدەگمەن ف اتّفاقی.

**هوُرك‌هوُرك:** وردەوردە، کەم‌کەم: (**هوُرك هوُرك** باران دبارە) ف کم کم.

**هورگ:** کرش، عوُر، ورگ ف شکمبه.

**هۆرگرت:** ١) بڵندی کرد، هەڵی گرت؛ ٢) پێ‌بو، داگرسا ف ١) برداشت؛ ٢) افروخته شد.

**هۆرگرتای:** داگیرساندن، پێ‌کردن، وێ‌کردن ف برافروختن.

**هۆرگـرتن:** ١) بڵنـدکـردن، هەڵگـرتن؛ ٢) پێ‌کردن، ئایساندن ف ١) برداشتن؛ ٢) افروختن.

**هۆرگرتەی:** هەڵگرتن ف برداشتن.

**هورگن:** زگ‌زل ف شکم گنده.

**هورگنە:** زگ‌زل ف شکم گنده.

**هۆرگە:** لای تاوهەڵات ف مشرق.

**هۆرگەز:** تاوگەز، تاوانگاز ف آفتاب‌زده.

**هۆرگەزتن:** تاوبردن، تاوانگازبوُن ف آفتابزده شدن.

**هۆرگەستن:** هۆرگەزتن ف آفتابزده شدن.

**هۆرگەستە:** تاوبردو ف آفتاب‌زده.

**هۆرگێڵان:** زڤرین، وەرسووڕان، وەرچەرخان ف برگردان، چرخیدن.

**هۆرگێڵانن:** هۆرگێڵان کردن، ژێر ورۆکردن ف برگرداندن.

**هۆرگێڵای:** وەرگەڕیان، هۆرگێڵان ف برگردان، برگشتن، چرخیدن.

**هۆرگێڵنای:** هەڵگەڕاندنەوە، هۆرگێڵانن ف برگرداندن.

**هورم:** ١) ودم، ممبارەکی؛ ٢) ئیحتوبار، جێ‌باوەڕی؛ ٣) سەڵتو بێ‌ژن؛ ٤) کۆسە، موُلێ نەهاتگ وە زەلامی؛ ٥) ژنێکی نەناس ف ١) شگون؛ ٢) اعتبار؛ ٣) مجرّد؛ ٤) کوسه، بی‌ریش؛ ٥) یك زن ناشناس.

**هۆرم:** خەوێ که له خەودا ئەی‌بینن ف رؤیا، خواب.
**هورما:** خورما ف خرما.
**هورمان:** لێرەوارو مێشەی چوغور ف جنگل و بیشهٔ انبوه.
**هورمان:** تاسان، ورمان، وڕبوُن ف گیج شدن.
**هورمز:** ۱) ئەستێرەی مشتەری، کڕیار؛ ۲) خودای چاکەو رۆشنایی؛ ۳) ناوه بۆ پیاوان ف ۱) ستارهٔ مشتری؛ ۲) خدای نیکی و روشنایی؛ ۳) نام مردانه.
**هورمزاوێ:** گوندێکی لای سەردەشته له کوردستان ف نام روستایی در کردستان.
**هورمزگا:** مزگەوتی پەیڕەوانی زەردەشت پێغەمبەر ف عبادتگاه زردشتیان.
**هورمزگان:** مزگەوتان: (**هورمزگان** زمان ئاتەران کوژان) «فۆلکلۆر» ف عبادتگاهها.
**هورمل:** لەو گوندانەی کوردستانه که بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.
**هوُرموُر:** خرت‌و پرت ف خرت و پرت.
**هورمه:** ۱) گرمه؛ ۲) بریتی له ژن ف ۱) غرنب؛ ۲) کنایه از زن.
**هورمەت:** رێز، قەدر، حورمەت، روُمەت ف احترام.
**هورمەزڕ:** خەوزڕان، خەوپەڕین ف خواب پریدن.
**هورمی:** هرمی، هارمێ ف گلابی.
**هورمێ:** حورمێ، وتـەی مێرد بۆ دوانـدن، ئەی ژنه‌که ف کلمهٔ خطاب شوهر به همسر.
**هورمیت:** گوندێکه له کوردستان بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.
**هوُرمێش:** ۱) مێش؛ ۲) کۆمەڵی مێشان، مێشی زۆر ف ۱) مگس؛ ۲) مگسها.
**هوڕمین:** گرماندن ف غرنبیدن
**هوڕن:** ۱) کێوی بڵنـد که تۆقـەسەری دەشتایی‌و گوڕ بێ؛ ۲) ناوی دو کوێستانه له کوردستان؛ ۳) بوڕی ترومبیل ف ۱) کوه بلندی که قلّهٔ آن چون دشت هموار باشد؛ ۲) نام دوییلاق در کردستان؛ ۳) بوق ماشین.
**هۆرنگ:** برینگ ف دوکارد.
**هۆڕنه:** ۱) هوڕن؛ ۲) زۆزانا بلند ف ۱) نگا: هوڕن؛ ۲) کوه ییلاقی بسیار بلند.
**هوروژ:** وروژ ف نگا: وروژ.
**هوروژان:** وروژان ف نگا: وروژان.
**هوروژم:** وروژم، پەلاماری به توندی ف نگا: وروژم.
**هوروژم کردن:** پەلاماردان به کۆمەڵ ف هجوم بردن.
**هوره:** وره، قەوەتی دڵ، زراو ف زهره، شجاعت، قوّت قلب.
**هوڕه:** ۱) مێشـوولـەی درشت، مێشـولـەی تاو لەرز؛ ۲) تەم‌و سەرمـای ناوەخت؛ ۳) لۆکـەی پاك‌و شیکـراو: (وەك **هوڕەی** لۆکه نەرمه)؛ ۴) گڕەبا، بای سەمون؛ ۵) گوندێکه له کوردستان بەعسی وێرانی کرد ف ۱) پشهٔ مالاریا؛ ۲) سرما و مه غلیظِ نابهنگام؛ ۳) پنبهٔ پاك و حلّاجی شده؛ ۴) باد تنـد شرقی همـراه مه؛ ۵) از روستـاهـای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.
**هۆره:** ۱) دەوروبەر؛ ۲) پوازی ئەستوُر بۆ قەڵش وێك‌نەهاتنی دارێ که دەیشکێنن به تەور؛ ۳) قامێکی جافانه؛ ۴) سەیرانگا؛ ۵) جێگەی زۆر بڵند، کێوی بڵند؛ ۶) گۆرانی بەسۆزه ف ۱) پیرامون؛ ۲) پفازکلفت، گاوه؛ ۳) آهنگی است؛ ۴) گردشگاه؛ ۵) کوه بلند؛ ۶) ترانهٔ زیرلبی، زمزمه.
**هوُره:** کای ورد ف کاه ریز.
**هوڕەبا:** بای ساردوتوند به مژەوه ف باد تند شرقی همراه مه.
**هورەبـەردان:** ۱) زراوچوُن، ترسان؛ ۲) ناهومێدبوُن ف ۱) زهره ترك شدن؛ ۲) نومید شدن.
**هوُرەشۆپ:** پێشەنگ، رەمکێش، سەرگەله ف پیشاهنگ.
**هوُرەك:** پیتی ورد له ئەلفوبێتکەی لاتینی‌دا ف حروف کوچك در خط لاتین.
**هوڕەم:** رەوەدەبەراز ف گلهٔ گراز.
**هورەنده:** شوێن، شوُن، شوێن‌پێ ف رد، رد پا.
**هوُرەنێڕ:** توژەرەوه ف محقّق، پژوهشگر.
**هوڕەو:** هوڕەم ف گلهٔ گراز.
**هوُرهوُر:** ورد ورد، زۆر ورد ف بسیار ریز.
**هورەهور:** دەنگی بەتەوژمی باران ف صدای باران شدید.
**هۆرەهۆر:** لۆرەلۆر، گۆرانی له ژێر لێوانەوه ف زمزمه.
**هۆڕەهۆڕ:** دەنگی ناڵاندنی بەرزی گاو چێڵ ف صدای نالهٔ بلند گاو.
**هۆرەوری:** پەلکەزێڕینه ف رنگین کمان.
**هوڕی:** ۱) قوڕ، حەڕی؛ ۲) گێژی، وڕی، تاسان ف ۱) گِل؛ ۲) گیجی و منگی.
**هۆری:** ۱) حۆری، کچی جوان له بەهەشتا؛ ۲) ناوه بۆ ژنان ف ۱) حور بهشتی؛ ۲) نام زنانه.
**هوُری:** ۱) وردی، دژی درشـتـی؛ ۲) ورگ، گەده؛ ۳) حۆری ف ۱) خردی؛ ۲) شکمبه؛ ۳) حورِ بهشتی.
**هوریَ‌تاردەنه:** ئاشت‌بوُنەوه، سازان ف آشتی کردن، سازش.
**هوریا:** زیقه، چەقەچەق: (ئەم هەراو **هوریایه** چی‌یه؟) ف جیغ و داد.
**هۆریزا:** بەرزەوەبو، رابو ف برخاست.
**هۆریزاد:** بەچکەحۆری، ناوه بۆ ژنان ف نام زنانه.
**هۆریزان:** هەڵسان ف برخاستن.
**هۆریزای:** هەڵسان ف برخاستن.
**هۆریزنای:** هەڵساندن ف برخیزاندن.
**هۆریزیای:** هەستان ف برخاستن.
**هۆریستەی:** هەڵسان ف برخاستن.
**هۆریشه:** ریوی، رواس ف روباه.
**هورین:** دەنگدانەوەی ئاوی زۆر بەتەوژم ف صدای جریان شدید آب.
**هۆرێن:** لەو گوندانەی کوردستانه که بەعسی کاولیان کرد ف روستایی

در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**هورینگ:** مەرەکەفدان، دەوات ف دوات.

**هورێنە:** وڕێنە، وڕاوە، قسەپەڕاندن ف هذیان.

**هۆریوە:** گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**هۆرییە:** کیژی بەهەشتی ف حور بهشتی.

**هۆریەس:** باسوُ، رنوُ، کەویەبەفر، کلێڵە، رنی، شاپە ف بهمن.

**هۆز:** ١) عاشیرەت؛ ٢) تۆزی لە زەوی بەرزەوەبوُگ: (باهۆز، واتا: گێژەلوُکە)؛ ٣) تاپۆرە، کۆمەڵێ مرۆ ف ١) عشیره، ایل؛ ٢) گردوخاك از زمین برخاسته؛ ٣) جمعیّت، جماعت، گروهی از مردم.

**هۆزان:** ١) عێلات، عاشیرەتان؛ ٢) زۆر زانا؛ ٣) پارچە شێعرێك، قەسیدە؛ ۴) هەستیار، شاعیر ف ١) ایلات، عشایر؛ ٢) بسیار دانا، علّامه؛ ٣) قصیدهٔ شعر؛ ۴) شاعر.

**هۆزانڤان:** ١) شاعیر، بوێژ؛ ٢) کەسێ کە شێعری خەڵك بە گۆرانی دەڵێ ف ١) شاعر؛ ٢) سرایندهٔ اشعار مردم.

**هۆزخواجە:** گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**هۆزۆر:** هەزار ف هزار.

**هۆزەرۆ:** گیایەکە ف گیاهی است.

**هۆزەڵان:** گیایەکە ئەخورێ ف گیاهی است خوردنی.

**هۆزەلاو:** هۆزەڵان، گیایەکە لە کانیاودا دەڕوێ ف گیاهی است.

**هوزهوز:** دەنگی سەیان ف صدای سگها.

**هۆژان:** فێربوُن، راهاتن ف یادگرفتن، آموختن.

**هۆژاندن:** فێرکردن، راهێنان، هین کرن ف تعلیم دادن.

**هۆژاندی:** فێر، راهاتو ف یادگرفته، آموخته.

**هوژم:** تەکاندان ف تکان دادن.

**هوژوم:** پەلامار ف هجوم، حمله.

**هوژە:** گژەی با ف صدای تندباد.

**هوُژە:** بەگەل دەرچوُنی مێروله ف گروهی رفتن مورچگان.

**هوژەم:** رەوەدەبەراز ف رمهٔ خوك، گلهٔ گراز.

**هۆژین:** هەڤۆت، راهاتن. هین‌بوُن ف یادگرفتن، آموختن.

**هوس:** ١) وس، بێدەنگ بە؛ ٢) رەڵم، رەمڵ ف ١) هیس؛ ٢) ماسه.

**هۆسا:** ١) وسا، ئاوها؛ ٢) وەستا ف ١) این طور؛ ٢) اُستاد.

**هۆست:** ئالی، لا، نك، کن، جەم ف نزد.

**هۆستا:** وەستا ف اُستاد.

**هۆستاکار:** پیشەسازف استادکار، صنعتگر.

**هۆستایی:** کارامەیی لە پیشەدا ف اُستادی، مَهارت.

**هوستو:** ئەستۆ، مل ف گردن.

**هۆستە:** هۆستا ف اُستاد.

**هوسك:** وشك، هیشك، زوها ف خشك.

**هوسکو:** رەڵماوی ف ریگزار.

**هوسوُرە:** خەزوُر ف خش، پدرزن یا شوهر.

**هۆسێ:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**هوُسی:** ئەستوندەکی چادر ف ستون چادر.

**هوسیرە:** خەزوُر ف پدرزن یا شوهر، خش.

**هوسیرەما:** خەسو ف مادر زن یا شوهر.

**هوش:** بێدەنگ، وس ف هیس.

**هۆش:** ١) هش، بیر؛ ٢) وتـەی ڕاوەستانـدنی کەر؛ ٣) بزنی دەم و چاو بەڵەکی رەش و سپی ف ١) هوش؛ ٢) کلمهٔ ترمز اُلاغ، هُش؛ ٣) بز رخسار خلنگ.

**هوش‌بوُن:** دەنگ لێ‌بڕان، بێدەنگ‌بوُن ف ساکت شدن.

**هوشتر:** وشتر، دەوەهـ، سار، سال ف شتر.

**هۆشتر:** هوشتر ف شتر.

**هوشترالوك:** وشترخۆرکە ف خارشتر.

**هوشترەوان:** سارەوان ف ساربان.

**هوشگ:** لەخۆبایی، بەفیز ف متکبّر.

**هوشگـە:** پارەیێ کە زاوا دەیدا بۆ جیازکڕین ف پولی که داماد برای جهیزیّهٔ عروس می‌پردازد.

**هۆشنگ:** سێـوی بێ‌باف، هەتیوی باوك‌نەماو ف یتیم پدرمرده.

**هوشە:** ١) هاشە، دەنگی بای بەقەوەت؛ ٢) درۆو مەحتی خۆ کردن؛ ٣) ئامیانی پەنیر ف ١) صدای تندباد؛ ٢) لاف؛ ٣) پنیرمایه.

**هۆشە:** ١) وشی، وشی ترێ و خورما؛ ٢) گوڵی دەخڵ؛ ٣) هەستی ئەندام: (هۆشەی بۆکردنی نیە) ف ١) خوشهٔ میوه؛ ٢) خوشهٔ غلّه؛ ٣) حسّ اعضاء.

**هۆشەچن:** گوڵچین ف خوشەچین خرمن.

**هۆشەچە:** هۆشەچن ف خوشەچین خرمن.

**هوشەك:** وشەك، ورشەك ف نگا: وشەك.

**هۆشەکاری:** خۆهەڵکێشان، پەسنی خۆ دان ف خودستایی.

**هوشەکردن:** خۆهەڵکێشان، مەحتی خۆ کردن ف لاف زدن.

**هوشەکەر:** خۆهەڵکێش ف لاف‌زن.

**هوُشی:** وشی ترێ و خورما ف خوشهٔ میوه.

**هوشیار:** ١) وریا، خاوەن بیر و هۆش؛ ٢) نەنوستی، بەخەبەر ف ١) هُشیار؛ ٢) بیدار.

**هۆشیار:** هوشیار ف نگا: هوشیار.

**هوشیاربوُن:** ١) ئاگادار بوُن لە ماڵێ یا شتێ، چاوێری کردن؛ ٢) لە خەو بێداربوُن ف ١) مواظبت؛ ٢) بیداربودن.

**هوشیاربـوُنـەوە:** ١) ئاگاردار بـوُن لە شتێ کە نەدەزانـرا؛ ٢) لە خەو بێداربوُنەوە ف ١) آگاهی یافتن؛ ٢) بیدارشدن.

**هۆشیاربوُنەوە:** هوشیاربوُنەوە ف نگا: هوشیاربوُنەوە.

**هوشیارکـردنـەوە:** ١) ئاگاکـردن لە شتێ کە نەدەزانـرا؛ ٢) لە خەو بێدارکردن ف ١) آگاهی دادن؛ ٢) ازخواب بیدار کردن.

**هوشیـاری:** وریایی ف هُشیاری.

**هۆشیـاری:** هوشیاری ف هُشیاری.

**هۆفە:** گەندەمو لە دەم‌و چاو لا بردن ف موچینی از رخسار.

**هوفە:** وفە، کوانێکە لە ئاژەڵ دێت ف نوعی دُمل ویژهٔ دام.

**هوفەهوف:** هاشەهاشی شەپۆل ف صدای پیاپی امواج.

**هۆڤ:** ١) کێوی، دڕنـدە؛ ٢) چەقـاڵتـە؛ ٣) ترسێنـەر، پیاوتـۆقێن؛ ٤) زەبەلاحی ملهوڕی هیچ لە دنیا نەزان ف ١) وحشی؛ ٢) گوشت پر رگ و پی؛ ٣) مخوف، ترسناك؛ ٤) گردن کلفت نادان.

**هۆڤا:** هۆ ئەوێ، هێمایە بۆ دوور ف آنجا، اشاره به دور.

**هۆڤـەبەر:** ١) ئاکاری وەحشیانە؛ ٢) لەخۆبایی؛ ٣) نامەردو نزم ف ١) رفتار وحشیانه؛ ٢) متکبّر؛ ٣) پست و نامرد.

**هۆڤەچو:** بۆ هۆو شوێنە ڕۆیشت ف به آنسو رفت.

**هۆڤی:** کێوی، وەحشی، هۆڤ ف وحشی.

**هۆڤیتی:** دڕندەیی، بڕێتی لە زوڵم‌کردن ف کنایه از وحشیگری.

**هۆڤینی:** هۆڤیتی ف نگا: هۆڤیتی.

**هۆق:** ١) ڕشـانـەوە؛ ٢) دەنگی گەروو لە ڕشـانەوەدا؛ ٣) دەنگی بەرزی گامێش ف ١) قی؛ ٢) صدای گلو در بالاآوردن؛ ٣) صدای گاومیش.

**هۆقە:** ١) دەنگی گامێش، هۆق؛ ٢) وەقە، سەنگێکە بۆ شت پێ کێشان، حۆقـە؛ ٣) فێڵ‌و تەڵەکە ف ١) صدای گاومیش؛ ٢) وزنی است؛ ٣) حیله و نیرنگ.

**هۆقەباز:** فێڵباز، دەسبڕ ف حقّه‌باز.

**هۆك:** ١) تاسـە، ئارەزوو؛ ٢) با، ئیشتیای گان؛ ٣) گە، مان؛ ٤) نۆك؛ ٥) ڕاهی کردن، کردنـەوەی گرێ‌و شتی دژوارو ئاڵـۆز؛ ٦) هێك، هێلکە، هاك؛ ٧) قوژبن، گۆشـــە؛ ٨) نەرم‌ومـــلایم؛ ٩) بیانـــو دۆزینـەوە بۆ کارنەکردن ف ١) آرزو؛ ٢) آرزوی جماع؛ ٣) اعتصاب؛ ٤) نخود؛ ٥) بازکردن گره؛ ٦) تخم‌مرغ؛ ٧) گوشه؛ ٨) نرم و ملایم؛ ٩) بهانه برای تنبلی.

**هوك:** ١) خوگرتـــن، عادەت‌کردن؛ ٢) گەڕیدەو سەرلـــێ‌شێواو؛ ٣) وازوازی؛ ٤) نەرم‌ومـلایم؛ ٥) خوێلـەکاربوێر، لەبیانو ف ١) عادت و خوگرفتگی؛ ٢) هرزه‌گردِ سراسیمه؛ ٣) دمدمی مزاج؛ ٤) نرم و ملایم؛ ٥) تنبل از زیرکار دررو.

**هوکارە:** خوپێوەگرتو، ئالوودە ف خوگرفته به عادتی.

**هوکارەبوون:** خوپێوەگرتن، ئالوودەبوون ف خوگرفتن، عادت کردن.

**هوکارە کردن:** فێری عادەتێ کردن ف معتاد به عادتی کردن.

**هوك‌تادایش:** لە قوژبن خزیو ف به‌گوشه خزیده.

**هۆکردنەوە:** هۆدانەوە ف نگا: هۆدانەوە.

**هۆکش:** وتەی کەرڕاوەستاندن ف کلمهٔ ترمز الاغ، هُش.

**هۆك کردن:** مان‌گرتن، گەگرتن ف اعتصاب کردن.

**هوك‌موك:** کاری بێ‌سەرەو بەرە، تێکەو لێکە ف کاردرهم وبرهم.

**هۆکڵ:** نۆکەری بەردەست ف پادو، نوکر.

**هۆکن:** گەگر، مانگر ف اعتصاب کننده.

**هۆکە:** ئاوا بکە ف چنین کن.

**هۆکەر:** زەرف لە ڕێزماندا، جێهك ف ظرف در دستور زبان.

**هۆکـەك کەروش:** ١) ئەم‌بەر ئەوبـەرکردن لە ڕێگەدا؛ ٢) بە ڕێگەی پڕ خوارەکەو پێچەکەدا ڕۆیشتن ف ١) به شکل مارپیچ راه رفتن؛ ٢) از راه پرپیچ و خم عبورکردن.

**هۆکی:** ١) شەقێنی بەسواری؛ ٢) وازوازی، دەمدەمی ف ١) گوی بازی سواره؛ ٢) دمدمی.

**هۆکێ:** تۆلاز، نێرێ کە زۆر دەوری مێ بنە دەدا ف شهوت‌رانِ کامجو.

**هۆگاڵە:** هەراو هوریا ف سر وصدا.

**هۆگان:** خەتی جووت لەم‌سەر تا ئەوسەر: (هۆگانەجووتێ درێژە) ف طول شیارِ شخم.

**هۆگج:** بەران، وەران، نێرەبەز ف قوچ.

**هۆگچ:** ١) شەك‌بەرانی دوساڵە؛ ٢) بەرانی پەڕینێ ف ١) قوچ دوساله؛ ٢) قوچ فحل.

**هۆگـر:** ١) خوگرتو: (ئەم مناڵە هۆگری منە)؛ ٢) خوو، عادەت: (هۆگری گرتوە) ف ١) اُنس گرفته، عادت کرده؛ ٢) عادت کردن.

**هۆگربوون:** خوپێ‌گرتن، عادەت کردن ف عادت کردن، انس گرفتن.

**هۆگرتن:** عادەت‌کردن، خوپێ‌گرتن ف عادت کردن، خوگرفتن.

**هۆگری:** عادەت‌کردن، خوپێ‌گرتن ف عادت کردن، خو گرفتن.

**هۆگە:** دێخوون، هۆجەنە ف بندشلوار.

**هۆگەچ:** ١) بەرانی داشت، بەرانی مەڕتێ‌بەردان؛ ٢) بەرهەڵست، دژ ف ١) قوچ فَحل؛ ٢) معارض، ضدّ.

**هول:** گوڵێکی زەردە ف گُلی است زردرنگ.

**هوڵ:** نەخۆشی ئاتەشەك ف بیماری آتشك.

**هۆڵ:** ١) خاڵی، بێ هیچ شت: (بیابانی چۆڵ‌و هۆڵ)؛ ٢) کڕێوەو مژ؛ ٣) حۆڵ، نەفـام؛ ٤) مەیدانی شەقێن‌و گۆبـازی؛ ٥) گۆی شەقێن؛ ٦) گوڕەو زەنازەنا؛ ٧) دەنگی باریکی گا؛ ٨) دەنگی گوێرەکە؛ ٩) کەللا، هەڵمـــات؛ ١٠) مزراق؛ ١١) ئۆدەی زل؛ ١٢) بڵنـدایی؛ ١٣) چاك، هێژا؛ ١٤) نەتـــرس؛ ١٥) گێرە ف ١) خالـی از هر چیز، کویر؛ ٢) مەوکولاك؛ ٣) هالو؛ ٤) میدان چوگان بازی؛ ٥) گوی چوگان بازی؛ ٦) سروصدا، غریو؛ ٧) صدای نازكِ گاو؛ ٨) صدای گوساله؛ ٩) تیله؛ ١٠) گردنا؛ ١١) اتاق بزرگ؛ ١٢) بلندی؛ ١٣) خوب؛ ١٤) شجاع، نترس؛ ١٥) خرمنکوبی.

**هۆڵ:** ١) ئاغـەڵی پەز؛ ٢) ژووری گەورە لە ماڵـدا؛ ٣) جاش‌و جانـوی یەکساڵە ف ١) آغل؛ ٢) هال، سرسرا؛ ٣) کُرّهٔ یك سالهٔ الاغ و مادیان.

**هوول:** ١) واش، بەش: (پیاوێکی زەلامی سوورهـــوول بو)؛ ٢) موزەردی ئامـاڵ خورمایی؛ ٣) سەرلێ‌شێواو، واقوڕ؛ ٤) گای زۆر قەڵەوی زل؛ ٥) بزنی گوێ‌سوور؛ ٦) بۆری خۆڵەمێشی تاریك؛ ٧) خۆهەڵکێشان ف ١) مایل به؛ ٢) مو زرد مایل به خرمایی؛ ٣) سراسیمه، هاج وواج؛ ٤) گاو تنومند و فربه؛ ٥) بزگوش قرمز؛ ٦) خاکستری رنگ تیره؛ ٧) لاف.

**هۆڵ ئایاك:** ئەوی هەرەچاکە، باشترینەکە ف بهترین.

**هۆلارە:** شەڵتەی کوندەئاو پێ کێشان ف گالهٔ خیگ آب‌کشی.

**هۆلان:** گەمەی شەقێن بەگۆچان‌و گۆ ف چوگان‌بازی.

**هۆلان:** هۆلان ف چوگان‌بازی.
**هۆلاندن:** ۱) هۆڕاندنی گا؛ ۲) دەنگی درێژی گوێرەکە ف ۱) صداکردن گاو؛ ۲) صداکردن گوساله.
**هۆلانه:** گەمەی گۆیێن ف گوی بازی.
**هۆلباف:** خۆهەڵکێش، بەشات‌وشوُت ف لاف‌زن.
**هۆلدان:** برێتی له ورگ ف کنایه از شکم، معده.
**هۆلس:** ئارانشین، دژی کۆچەر ف نقطه مقابل کوچ‌نشین، ساکن در یك محلّ ثابت.
**هولف:** کونی زۆر گوشاد ف سوراخ فراخ.
**هولفدو:** گرتوخانه ف زندان.
**هۆلـك:** ۱) کۆخ، خانوی چکۆله له دەشت؛ ۲) کەپر ف ۱) کوخ؛ ۲) خانهٔ باغ، کپر.
**هولکاندن:** ڕاکێش‌کردن به سەر زەویدا ف بر روی زمین کشیدن.
**هۆل کەردش:** گێره‌کردن ف خرمن کوبیدن.
**هولکی:** ۱) بەعەرزا ڕاکێشرا؛ ۲) ڕەتی برد، هەڵەنگوت ف ۱) بر زمین کشیده شد؛ ۲) سکندری خورد.
**هولل:** ۱) دەمی نیمەڕۆ؛ ۲) هەل ف ۱) ظهرهنگام؛ ۲) فرصت.
**هوللا:** کولاورۆژنه ف روزنه.
**هۆللك:** حەشارگەی ڕاوچی ف کمینگاه شکارچی.
**هوللکن:** قوُچ، قوُچ‌هەڵکەوتو ف مخروط، مخروطی.
**هولله:** گەمەیەکە به میچ، حوللەمەرەسێ ف نوعی بازی.
**هولم:** هەڵم، هلم ف بخار.
**هۆلمان:** مەعدە، مەدە، عوُر، ورگ ف شکمبه، معده.
**هۆلنج:** دڵ‌پێکاهاتن ف تهوّع.
**هولنگ:** تراو، شل ف آبکی، رقیق.
**هولـوُ:** ۱) هەرمێ، هەمـروّ؛ ۲) لوُس، نەرم له دەستـان، دژی زبر ف ۱) گلابی؛ ۲) صاف ونرم.
**هولو:** خۆخ، کۆخ، قۆخ ف هلو.
**هۆلۆشه:** پیرخەنیله، برۆشی ساوار ف ریزهٔ بلغور.
**هولۆل:** هلۆل، ناوخاڵی ف کاوك.
**هولـوُلی:** ۱) حولحولی، گەللایی‌و سەرەڕۆ؛ ۲) بێ‌ئارام، هەدانەدەر؛ ۳) مەزەبـێکــه پەیڕەوانــی لایان وایه پاش مەرگ گیانیان دەچێتــه بەر زیندەوەرێکی تر ف ۱) گیج و منگ و سَرسری؛ ۲) ناآرام؛ ۳) مذهب تناسخ.
**هۆلۆنج:** دڵ‌پێکاهاتن، سەرەتای ڕشانەوە ف تهوّع.
**هولوەزه:** تێکوڵی سەوزی گوێز ف پوست سبز گردو.
**هوله:** جۆبرە، جۆبرکه، مڵه ف حشرهٔ آبدزدك.
**هۆله:** ۱) دەنگی بانگ‌کردنی گوێرەکە؛ ۲) دەنگی لێخوڕینی گوێرەکە؛ ۳) دەنگەدەنگی بەگریانەوە: (هەراو **هۆلەهۆلیەتی**)؛ ۴) گێره ف ۱) صدای خواندن گوساله؛ ۲) کلمهٔ راندن گوساله؛ ۳) صدای گریه‌آمیز؛ ۴) خرمنکوبی.
**هوُله:** ۱) هوُل؛ ۲) قوُله، قیڕاندن بۆ گورگ‌ڕەواندن ف ۱) نگا: هوُل؛ ۲) غریو از پس گرگ.
**هۆلـه:** ۱) گێره؛ ۲) گونـدێکه له کوردستان ف ۱) خرمنکوبی؛ ۲) نام دهی در کردستان.
**هولی:** ۱) حولی، لوُس له دەستان؛ ۲) هەڵۆ ف ۱) املس، صاف وخوش دست؛ ۲) عقاب.
**هۆلی:** ۱) هوّڵ، جاش‌و جانوی ئێکساڵه؛ ۲) گێژی، دەبەنگی، حۆلی؛ ۳) گێرەی کلۆش؛ ۴) گۆچـانی گۆبـازی ف ۱) کُرّهٔ یك سالـه؛ ۲) هالویی؛ ۳) خرمنکوبی؛ ۴) چوگان.
**هۆلێ:** ئاوها، ئەئاوا، بەم‌جۆرە: (ئەو خەبەر نه **هۆلێ‌یه**) ف این طور، به این نحو.
**هۆلی:** جاشك‌و جانو ف کرهٔ الاغ و مادیان.
**هۆلێر:** سپیندار ف چنار، تبریزی.
**هولیسك:** زمان لوُس، کلکەسوُتەکەر ف متملّق، چرب زبان.
**هولیسکی:** زمان لوُسی، کلکه سوُته ف تملّق.
**هۆلی کرن:** گێره‌کردن ف خرمن کوبیدن.
**هۆلی کری:** گێره‌کراو ف خرمن کوبیده.
**هولیلك:** ۱) سەقر، باڵدارێکی ڕاوکەره؛ ۲) خەرتەل، ورخال ف ۱) صقر، پرنده‌ای شکاری؛ ۲) لاشخور.
**هۆلین:** قوُله‌کردن ف غریو راه انداختن.
**هۆلێن:** شەقێن، گۆیێن ف بازی گوی و چوگان.
**هوم:** شوم، بێ‌فەڕی: (فلانکەس **بەهومه** یانی شومی هەیه) ف شوم.
**هۆم:** خۆم، وژم ف خودم.
**هوما:** پیرۆزه ف هما.
**هۆما:** خودا، خوا، هوُمای ف خدا.
**هوُما:** هۆما، خودا، خوا ف خدا.
**هومار:** تەخت‌و ساف ف هموار.
**هۆمارتش:** ژماردن ف شمردن.
**هوُمارتش:** ژماردن، هۆمارتش ف شمردن.
**هوُمارتۆخ:** ژماریار ف محاسب، آمارگر.
**هومال:** هاوچاو، بەربەرەکانی کەر ف هم‌چشم، رقیب.
**هۆمام:** دەسەڵات‌دار، پیاوی مەزن ف شخص مُقتدر.
**هۆمان:** ۱) خۆمان؛ ۲) خودا به شێوەی کوردی زازا ف ۱) خودمان؛ ۲) خدا.
**هۆمای:** خودا، هۆما ف خدا.
**هوُمای:** هۆما ف خدا.
**هوُمای‌بکۆ:** خوا حەزکا، خوا بیکا ف خداکند، انشاءاله.
**هوُمای‌زانۆ:** خوا ئەیزانێ ف خدا می‌داند.
**هوُمای‌سینەنی:** بەشقی خودا، بیکه له ڕاهی خوادا ف بەخاطر خدا.
**هوُمـــای کەردك:** ۱) سوپـــاسـی خودا؛ ۲) بەرەکـــەتی خودا ف ۱) شکرخدا؛ ۲) برکت خدا.
**هوُمای کەنی:** بەشقی خودا ف بەخاطر خدا.
**هوُمای گرۆتا:** خوا لەکۆڵی کاتەوە، خوا گیانی بسێنێ ف خدا او را

بکشد.

**هوٛمای گرەوتا:** هوٛمای گروٚتا [ف] خدا او را بکشد، خدا جانش بستاند.

**هومـایل:** مەڕمـەڕشـا. پارچـەی سپی سادە. خامهەلاوی زۆر باش کە دەکرێتە کراس [ف] چلوار.

**هوٛمای‌نێکۆ:** خوا نەکا [ف] خدانکند.

**هوٛمای‌واژۆ:** بە ئیزنی خوا [ف] بە امید خدا، بەخواست خدا.

**هومایون:** ١) قامێکـی کۆنە؛ ٢) ممبـارەك [ف] ١) آهنگی است؛ ٢) فرخندە.

**هومایونی:** جۆرێ خەت [ف] نوعی خط.

**هومایی:** هومایل [ف] چلوار.

**هۆمایی:** تایبەتی، خۆماڵی [ف] مخصوص، خصوصی.

**هومبان:** هەنبانە، هەوان، هەوانە، هەمانە [ف] انبان.

**هومبانی:** جانەوەری قاپورکدار [ف] جانوری کە لاك دارد.

**هومبەر:** همبەر، بەرانبەر [ف] برابر.

**هومبی:** دو ژنی دو برا بۆ ئێکتـر، دو هێوەرژن [ف] نسبت دو زن دوبرادر باهم، جاری.

**هومجـــەهـانی:** گونـدێکـە لە کوردستـان بەعسی وێرانی کرد [ف] از روستاهای ویران شدۀ کردستان توسط بعثیان.

**هۆمدەم:** هاودەم [ف] همدم.

**هۆملکێ:** دەگژڕاچوٛنەوە، بەربەرەکانی کردن [ف] مقابلە، رودررویی.

**هومە:** کوٛپە [ف] خُم.

**هۆمە:** هومە، کوٛپە [ف] خُم.

**هومەراخ:** گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد [ف] از روستاهای ویران شدۀ کردستان توسط بعثیان.

**هومـەرامـان:** لەو گونـدانـەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد [ف] روستایی در کردستان کە بعثیان آن را ویران کردند.

**هۆمەرقوم:** گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد [ف] از روستاهای ویران شدۀ کردستان توسط بعثیان.

**هۆمـەرمـەلا:** لەو گونـدانـەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد [ف] روستایی در کردستان کە بعثیان آن را ویران کردند.

**هۆمـەرمـەنـدان:** گونـدێکـە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد [ف] از روستاهای ویران شدۀ کردستان توسط بعثیان.

**هومـەرەسینـا:** لەو گونـدانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد [ف] روستایی در کردستان کە بعثیان آن را ویران کردند.

**هۆمەڵغەزا:** چەقەو گورەو زەنازەنای بەکۆمەڵ [ف] همهمە و جنجال وشلوغی.

**هۆمەلێرە:** دیزەی گۆشتاو تێدالێنان [ف] دیزی آبگوشت.

**هۆمەیش:** لە کۆکردنەوەی تفاق بوٛنەوە [ف] فراغت از جمع‌آوری علوفە.

**هۆمەیی:** پەزی بۆری تاریك [ف] گوسفند توسی رنگ تیرە.

**هومێ:** ئومێد، همێ [ف] امید.

**هومێد:** هومێ [ف] امید.

**هومێدەوار:** بەئاوات [ف] امیدوار.

**هۆن:** ١) پاشگر بەمانا کەسێ کە ئەوەنێ؛ ٢) وەندراو؛ ٣) دەنگی گریانی سەبـرو بەمینگـە: (**هۆنەهۆن** مەکە)؛ ۴) ئەم جۆرەن؛ ۵) هوٛن، ئێوە، ئەنگۆ، هنگ؛ ۶) خەت لەزەویدان بۆ ئاو پێداهێنان؛ ۷) خەوخەون [ف] ١) پسوند بە معنی بافندۀ گیسو یا ریسمان؛ ٢) بافتە؛ ٣) صدای گریۀ آهستە؛ ۴) این طورند؛ ۵) شما؛ ۶) شیار آبیاری در زمین؛ ۷) رؤیا، خواب.

**هوٛن:** ١) ئەنگۆ، هنگ، هنگۆ، ئێوە؛ ٢) خوٛن، خین، خوٛین، خوێن؛ ٣) دارژانی بێ‌پسانەوە: (**هوٛن هوٛن** فرمێسکی لە چاو دەڕژا) [ف] ١) شما؛ ٢) خون؛ ٣) ریزش بدون انقطاع.

**هۆنا:** هێشتا، هێمان [ف] هنوز.

**هۆناس:** سەرپاڵەی دروێنە [ف] سردستۀ دروگران.

**هوٛناڵو:** خوێناوی [ف] خون‌آلود.

**هۆنان:** ١) تەنین، چنین؛ ٢) برێتی لە بنیات‌نانی دام‌و دەزگای میری یان بازرگانی [ف] ١) بافتن؛ ٢) کنایە از تشکیل سازمان.

**هۆناندن:** ژێدەری هۆنان [ف] نگا: هۆنان.

**هوٛناو:** خوێناو، ئاوی خوێناوی [ف] خونابە.

**هۆنـدراو:** ١) داوی بەیەکەوە بادراوی تێك‌هەڵکشاو؛ ٢) دەنکەموٛروی بەبەنەوەکراو [ف] ١) بهم بافتە؛ ٢) بەرشتە کشیدە.

**هۆندراوە:** ١) هۆندراو؛ ٢) برێتی لە بە شێعر گوتراو [ف] ١) نگا: هۆندراو؛ ٢) کنایە از کلام منظوم.

**هۆندك:** هندك، کەم [ف] کم.

**هۆندن:** وەندن [ف] نگا: وەندن.

**هۆندنەوە:** هۆندن، وەندن [ف] نگا: وەندن.

**هوندور:** ئەندەروٛن، ژوٛرەوە [ف] اندرون، تو.

**هوندورین:** ژوٛرەوە، هەناو، دەروٛن [ف] درون، تو.

**هۆندە:** ١) هێندە، ئەوەندە؛ ٢) پتر [ف] ١) این قدر؛ ٢) بیشتر.

**هۆندە کە:** هندك، کێم، کەم [ف] کم.

**هۆنراو:** هۆندراو [ف] نگا: هۆندراو.

**هۆنراوە:** هۆندراوە [ف] نگا: هۆندراوە.

**هوٛنڕێژ:** خوێنڕێژ [ف] خونریز.

**هونژەك:** وەنەوز [ف] چُرت خواب.

**هونژی:** وەنەوزی هاتێ [ف] چُرت زد.

**هونـژین:** ١) وەنـەوزدان؛ ٢) راکشـانو درێژبـوٛن بۆ سوٛکـەخـەو؛ ٣) خەوبردنەوە، پۆنژین [ف] ١) چُرت زدن؛ ٢) دراز کشیدن برای خواب کوتاە؛ ٣) کسی را خواب بردن.

**هۆنقەراس:** هانقاس، ئەوهەندە، ئەم‌ئەندازەیە [ف] این اندازە.

**هۆنك:** فێنك [ف] خنك.

**هوٛنك:** فێنك [ف] خنك.

**هوٛنکایی:** فێنکایەتی [ف] خنکی.

**هۆنك‌با:** بایەکە لە باکوٛری خۆرهەڵاتەوە دێ [ف] باد شمال شرقی.

**هوٛنگ:** هوٛن، ئەنگۆ، هنگ، ئێوە، هەوە [ف] شما.

**هۆنگۆ:** هنگ، ئێوە، ئەنگۆ، وە [ف] شما.

**هونگوست:** قامك، تلی، پلی، تلهی ف انگشت.
**هونگوستر:** ئەنگوستیلەی دورمان ف انگشتانه.
**هونگوستەك:** هونگوستر ف انگشتانه.
**هونگوستیل:** ئەنگوستیلە ف انگشتری.
**هونگوستیلك:** ئەنگوستیلە ف انگشتری.
**هونگولیر:** ئەنگوستیلە ف انگشتری.
**هونگولیسك:** ئەنگوستیلە ف انگشتری.
**هونگولیسكێ:** كاڵەمستێن، پشكیلان ف نگا: كاڵەمستێن.
**هۆننەوە:** هۆندنەوە ف نگا: هۆندنەوە، وەندن.
**هونە:** خەنە، هەنە، گەڵای گیایەكە دەیهاڕن بۆ جوانیو دەرمان دەشێو ڕەنگی سوورە ف حنا.
**هۆنـە:** ۱) هۆنـدراو، پرچی هۆنـدراو؛ ۲) مووروی هۆنـدراو؛ ۳) نیشانە، نیشانەی باشی، ناكار: (**هۆنەی مێرانەیە**)؛ ۴) بەشوێن یەكا داوەرینی فرمێسـك: (**هـۆنەهۆنە فرمێسكی هاتەخوار**)؛ ۵) ئەوجۆرەن: (بەڵێ گش كەس **هۆنــە** بێوەفــانــە)؛ ۶) دەنگی گریانی سەبـر: (ئـەم **هۆنــەهـۆنـەت** لەچیە؟)؛ ۷) لوورەی گێژاو؛ ۸) هەڵبـەست، شێعـر، بەرانبـەری پەخشــان؛ ۹) نەسیم، شنـە ف ۱) بهم بافته؛ ۲) بەرشته كشیده؛ ۳) نشانۂ خوبی؛ ۴) ریزش اشك پیاپی؛ ۵) چنین هستند؛ ۶) صدای گریۂ آهسته؛ ۷) صدای گرداب؛ ۸) شعر، نظم؛ ۹) نسیم.
**هۆنە:** ماڵ، خانوی جێگەی ژیان ف خانه.
**هۆنەپا:** نۆكەری ناوماڵ ف نوكر پادوخانه.
**هۆنەدار:** بناوانی ماڵ ف خانەدار.
**هونەر:** دەسڕەنگینی، حونەر ف هنر.
**هۆنەر:** ۱) كەسێ كە دەهۆنێتەوە؛ ۲) برێتی لە شاعیر ف ۱) بافنده یا به رشته كشنده؛ ۲) كنایه از ناظم شعر، شاعر.
**هونەراوی:** شتێ كە حونەری تێدا دەكاركراوە ف هنری.
**هونەرمەن:** حونەرمەند، دەسڕەنگین، بەحونەر ف هنرمند.
**هونەرمەند:** هونەرمەن ف هنرمند.
**هونەروەر:** هونەرمەن ف هنرور، هنرمند.
**هونەری:** حوننەری، هونەرمەندانە ف هنرمندانه.
**هۆنهۆن:** ۱) گریانی سەبــری بێبڕانـــەوە؛ ۲) فرمێسـك داوەرینی بەشوێن یەكدا؛ ۳) دەنگی گێژاو ف ۱) گریۂ آهستۂ بدون انقطاع؛ ۲) اشك‌ریزی بدون انقطاع؛ ۳) صدای گرداب.
**هۆنەك:** پرچی وەهۆنراو ف زلف تابیده.
**هۆنەهۆنە:** هۆنهۆن ف نگا: هۆنهۆن.
**هۆنەیی:** ئاوەها، بەم تەرزە ف اینطور.
**هۆنی:** ئاوها، بەمجۆرە ف اینطور، چنین.
**هۆنی:** برێتی لە دوژمنی خوێنی ف كنایه از دشمن خونی.
**هونین:** هۆندنەوە ف نگا: وەندن، هۆندنەوە.
**هۆنین:** هۆندنەوە، موونین، موونادن ف نگا: موونادن.
**هۆنینەوە:** هۆندنەوە، وەندن ف نگا: وەندن.
**هۆو:** ۱) بەڵێ، ها؛ ۲) ئەو شتەی دوور ف ۱) كلمۂ جواب، بلی؛ ۲) آن، اشاره به دور.
**هۆوا:** هۆ ئەوجێیە، هیمایە بۆ دوور ف آنجا، اشاره به جای دور.
**هوواتش:** پێكەنین، خەنە، كەنین ف خنده.
**هوواتە:** ۱) پێكەنین؛ ۲) پێدەكەنێ ف ۱) خندیدن؛ ۲) خندید.
**هووایش:** پێكەنین ف خندیدن.
**هۆوت:** هوت، هەوت، حەوت، حەفت ف هفت.
**هۆوتای:** حەفتا. حەفتێ. هەوتای ف هفتاد.
**هۆوز:** ۱) سەوز، كەسك؛ ۲) حەوز، بڕكە، هەوز ف ۱) سبز؛ ۲) حوض.
**هۆوسار:** هەوسار ف افسار.
**هۆوق:** تاق، تاقی گومبەز، هەوق ف سقف گنبد.
**هۆول:** ۱) هەول، باش؛ ۲) نەترس ف ۱) خوب؛ ۲) نترس.
**هۆون:** خەو، خەون ف خواب، رؤیا.
**هۆونەیش:** تواشاكردن، لێمەیزاندن ف نگاه‌كردن.
**هووە:** پاڕو، سەوڵ، بێڵی دارین ف پارو.
**هۆوە:** ئەو شتەی لەبەرچاوەو دوور ف آنچیز.
**هۆوها:** هۆوە ف آنچیز.
**هۆوهانێ:** ئەوەتا لەوێیە ف اینك آنجا است.
**هۆوەت:** ئەو شتەت ف آن چیزت.
**هۆوەتا:** ئەوا لەوێیە ف اینك آنجا است.
**هۆوەتانێ:** هۆوەتا ف اینك آنجا است.
**هۆوەرە:** مێشەسی، چرگ، چێرگ ف هوبره.
**هۆوهە:** ئەو شتە لەبەرچاوە دوورەكە ف آن چیز كه نمایان است.
**هۆوەها:** ئەوەتانێ لەوێ ف اینك در آنجا است.
**هْوە:** پاڕو، بێڵی دارین، سەوڵ ف پارو.
**هوها:** وتەی گاڵتەپێكردن ف كلمۂ تمسخر.
**هۆهۆ:** ۱) وتەی جوتیار لە جووت‌لێخوڕیندا؛ ۲) بانگ‌كردنی مێگەل؛ ۳) بانــگ‌كردنی كەسێ لەدوورەوە: (هــۆهــۆ مام‌حەســەن)؛ ۴) وتـەی سەیرمانو باوەڕ نەكردن: (**هۆهۆ ئەوە تۆ دەڵێی چی؟**) ف ۱) تكیه‌كلام كشــاورز در شخم زدن؛ ۲) خوانــدن گله؛ ۳) حرف ندای دور؛ ۴) علامت تعجّب و ناباوری.
**هوهـو:** ۱) دەنگی گریان؛ ۲) خوێنـدنی كوند ف ۱) صدای گریه؛ ۲) صدای جغد.
**هوهوكەرە:** جۆرێ كوند ف نوعی جغد.
**هۆی:** ۱) وتەی بانگ‌كردنی دوور؛ ۲) گرێو، مەرج ف ۱) حرف ندای دور؛ ۲) شرط.
**هۆیاندن:** گـرێوكردن، مـەرج‌دانـان، مەرج‌بەستن، گرۆكردن ف شرط بستن.
**هۆیچ:** نەتشت ف هیچ.
**هوێر:** ورد، هوور ف خرد، ریز.
**هوێرك:** ۱) هوێر؛ ۲) گاتـو، شاتـو؛ ۳) گوێزنگ، قاپ ف ۱) خرد؛ ۲) شاه‌توت؛ ۳) قوزك پا.
**هوێزی:** ۱) خشت، جۆرێ نێزە بۆ شەڕ پێشو كورد دەكاریان دێنا، زەرگی

شەڕ؛ ۲) گورز؛ ۳) باقەی بەستراو لە گیا؛ ۴) دەسکەگوڵ [ف] ۱) نوعی نیزهٔ جنگی؛ ۲) گرز؛ ۳) بستهٔ گیاه؛ ۴) دسته‌گل.
**هۆیسیر:** کەندوی لەشوڵ‌تەنراو [ف] کندوی بافته از ترکه.
**هۆیسیل:** هۆیسیر [ف] کندوی غلّه بافته از ترکه.
**هۆیش:** چۆش، هوش، پیتی ڕاوەستاندنی کەر [ف] کلمهٔ ترمز الاغ.
**هۆیشك:** وشك، ئیشك [ف] خشك.
**هویکێ:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد [ف] روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.
**هویل:** ئاوا، ئاگار: (من لە **هویلا** نەبوم ئەمشەڕە کرِیا) [ف] آگاه، با اطلاع.
**هۆیل:** ۱) هۆل؛ ۲) حۆل، گێژ؛ ۳) پیاوی مۆخورمایی؛ ۴) والا، بەتاڵ، خالّی [ف] ۱) نگـا: هۆل؛ ۲) سراسیمه، گیج؛ ۳) آدم موخرمایی؛ ۴) خالی، تهی.
**هۆین:** ۱) ئێوە، وە، هنگ، ئەنگۆ، هۆن؛ ۲) فێر لە فێر بۆن [ف] ۱) شما؛ ۲) یاد از یادگرفتن.
**هۆین‌بۆن:** فێر بۆن [ف] یادگرفتن.
**هۆینك:** فێنك، ساردی سازگار [ف] خنك.
**هۆین کرن:** فێرکردن [ف] یاددادن.
**هۆیه:** یاڕو، سەوڵ، بێلی دارین [ف] پارو.
**هۆیها:** وتەی سەیرمان‌و باوەڕنەکردن [ف] کلمهٔ تعجّب و ناباوری.
هویی: هووە، پاڕو [ف] پارو.
**هۆیه:** نیر، داری سەرملی گاجۆتان لە کاتی جۆت‌کردندا [ف] یوغ.
**هە:** ۱) خاوەنی بۆن؛ ۲) وشەی دنەدان: (**هە** برام، **هە** کوڕم، **هە** لە منتان کەوێ)؛ ۳) وەرگرە، ها؛ ۴) پیتی فەرمان: (**هەڕ**و، **هەرۆ**)؛ ۵) ئەی، هۆ: (**هـە** یاران)؛ ۶) هەر: (**هە** بێژە، واتا: هەر باخێوە) [ف] ۱) موجود؛ ۲) کلمهٔ تشجیع؛ ۳) بگیر؛ ۴) حرف فرمان و دستور؛ ۵) ای، حرف ندا؛ ۶) همواره.
**هەء:** نە، نا، هنا [ف] نه.
**هەئنا:** هنا، نە، نا [ف] نه.
**هەب:** ۱) دانە، دەنك؛ ۲) تۆزێ، کەموکەیەك؛ ۳) دەغڵ؛ ۴) گزمۆڵەی دەرمان [ف] ۱) دانه؛ ۲) کمی؛ ۳) غلّه؛ ۴) قرص.
**هەبا:** بۆبا، خاوەنی بۆن بوایە [ف] اگر می‌بود.
**هەباس:** سوکەڵەناوی عەبباس [ف] مخفّف عبّاس، نام مردانه.
**هەباس‌چەمەك:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد [ف] روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.
**هەبان:** ۱) ببونایە، ببوایەن؛ ۲) همبان، هەوان [ف] ۱) اگر موجود بودند؛ ۲) انبان.
**هەباندن:** حەزلێ‌کردن، خۆشویستن [ف] دوست داشتن.
**هەبـانـە:** ۱) کۆپـەڵەو جەڕەی بێ‌دەسك؛ ۲) همبان [ف] ۱) خم و تنگ بی‌دسته؛ ۲) انبان.
**هەباهەب:** تاکەتاکە [ف] یکی یکی، دانه‌دانه.
**هەبت:** ببێ: (**هەبت** نەبت چونینە) [ف] موجود باشد.
**هەبـرمـان:** دانـەویڵەو سەوزی وشکی هەڵگیراو بۆ زستـان [ف] بنشن و سبزی خشك ذخیره شده.
**هەبڕەش:** سیاوڵە، ڕەشکەی کولێرە [ف] سیاه‌دانه.
**هەبڕەشك:** سیاوڵە، ڕەشکەی کولێرە [ف] سیاه‌دانه.
**هەبرینك:** برینگی پەزبڕینەوە [ف] دوکارد پشم‌چینی.
**هەبرینگ:** هەبرینك، دوێردی خوری‌بڕینەوە [ف] دوکارد.
**هەبس:** حەفس، گرتوخانە [ف] زندان، حبس.
**هەبشاندن:** بە لرفەو پەلە فرەخواردن [ف] پرخوری شتاب‌آمیز.
**هەبکی:** دانۆ، دانۆڵە، گەنمی لەئاودا کوڵاو [ف] گندم آب‌پز.
**هەبل:** ۱) پڕ، تژە؛ ۲) نەخۆشی گرْفت [ف] ۱) پُر؛ ۲) بیماری امتلا.
**هەبڵەق:** ئەبڵەق، بازو، بازك [ف] خلنگ، اَبْلَق.
**هەبلین:** ۱) پڕبـوون؛ ۲) نەخـۆشـی گرْفت؛ ۳) تۆشی نەخۆشی گرْفت بۆن؛ ۴) ئاڵۆزبۆن، سەرلێ‌شێوان [ف] ۱) پرشدن؛ ۲) بیماری امتلا؛ ۳) مبتلاشدن به امتلا؛ ۴) سردرگم.
**هەبن:** بەندی سنگی ڕەشماڵ [ف] بند دیرك سیاه‌چادر.
**هەبـو:** ۱) بوْ؛ ۲) دارا: (پیاوێ **هەبو** فەقیر نیە)؛ ۳) ئەوی هەیە [ف] ۱) بود؛ ۲) دارا؛ ۳) موجودی.
**هەبۆسان:** ڕازیانە، گیایەکی بۆن‌خۆشە [ف] رازیانه.
**هەبـوْن:** ۱) دارایی؛ ۲) دژی نەبۆن: (**هەیەتی**)؛ ۳) ئەوان بۆن [ف] ۱) دارایی؛ ۲) موجودیّت؛ ۳) بودند.
**هەبـوْنی:** ۱) دژی نەبـوْنی، دەوڵـەمـەنـدی؛ ۲) ژیو ساغی [ف] ۱) ثروتمندی؛ ۲) سلامت.
**هەبه:** خاوەن بۆن بە: (تۆ نابێ بچی هەر **هەبه**) [ف] موجودباش.
**هەبەت:** هەڵبەتە، هەڵبەت، بێ‌گومان [ف] البتّه.
**هەبەش:** هەراش، بەکەیف: (کارگ **هەبەشه**) [ف] بالیده، رشدکرده.
**هەبەشیك:** جۆرێ مقەڵی لە قوڕ، گڵێنەی وەك مەنقەڵی [ف] نوعی منقل گلین.
**هەبەك:** ۱) لەپی دەست، بەری دەست؛ ۲) پیچەك، کەموسکەیێ [ف] ۱) کف دست؛ ۲) اندکی.
**هەبەکو:** وێدەچێ کە [ف] مثل اینکه.
**هەبهەب:** وشەی دنەو هانەدانە لە شەڕدا [ف] کلمهٔ تشجیع در جنگ.
**هەبی:** ۱) خاوەن‌بۆن بی؛ ۲) هەبـو؛ ۳) جۆرێ کەندر؛ ۴) لۆکە [ف] ۱) باشی؛ ۲) بود؛ ۳) نوعی کنف، ریسمان؛ ۴) پنبه.
**هەبیس:** مرۆی تەرکەدنیاو پیاوی خوا [ف] زاهد، مرد خدا.
**هەبین:** بۆن [ف] بودن، وجود.
**هەبینا:** تۆزێکی تر، کەمێکی دیکە [ف] اندکی دیگر.
**هەپ:** ۱) بۆخی زەمینی تەڕ لەبەر گەرمای ڕۆژ؛ ۲) حەپ، عەف، حەپەی سەگ؛ ۳) خواردن لە زاراوی زاروکـانـدا [ف] ۱) بخار زمین؛ ۲) واق سگ؛ ۳) خوراکی درگویش کودکانه.
**هەپـرۆن:** وردو خاش، لەت‌و کوت: (لـەو شاخـەوە کەفـتـەژێر هەپرۆن‌بەهەپرۆن بو) [ف] خرد و خاش، لت وپار.
**هەپـرۆن‌بەهـەپـرۆن:** ۱) هەپـرۆنی زۆر؛ ۲) شاخی زۆر بەرزو دژوار: (چیایەکی **هەپرۆن‌بەهەپرۆنە**) [ف] ۱) خردوخاش و درهم شکسته؛ ۲)

پرتگاه بسیار سخت و بلند در کوه.
**هەپس:** حەفس، گرتوخانە ف زندان.
**هەپش:** ١) ئەسپێ، سپێ؛ ٢) پژمە؛ ٣) پڕکردنی دەفر بە پاڵەپەستۆ: (جەواڵ **هەپشاندن**) ف ١) شپش؛ ٢) عطسه؛ ٣) آکندن ظرف با فشار.
**هەپشاندن:** داگرتنی جەواڵ و دەفر پڕاوپڕ و بە پاڵەپەستۆ ف پرکردن ظرف با فشار.
**هەپش کرن:** پژمین، پشمین، پەنژین، سەبرهێنان ف عطسه‌کردن.
**هەپك:** ١) کەرکیت؛ ٢) تێلا؛ ٣) بەڕەی ئەستوُر؛ ٤) خواردنی منداڵ بە زمانی منداڵان، هەپێ: (**هەپکێ** بدە بەبکێ) ف ١) شانهٔ پودکوبی؛ ٢) چوب برگ‌کوبی؛ ٣) پلاس و گلیم ستبر؛ ٤) خوردنی در زبان کودکان.
**هەپلۆك:** ئالەکۆك ف گیاهی از تیرهٔ شنگ.
**هەپلە:** ١) کورتەبالای قەڵەو، خەپلە؛ ٢) وڕاوە، راواندن، وڕێنە ف ١) کوتاه‌قد چاق؛ ٢) هذیان.
**هەپو:** ١) تەواوبو بەزمانی زارۆکان، نەما، خەلاس بو؛ ٢) پەپوسلێمانکە ف ١) تمام شد به زبان کودکانه؛ ٢) شانه‌بسر، هُدهُد.
**هەپۆ:** ١) جۆرێ پێشکەی ورد؛ ٢) هەپە، کەرکیت ف ١) نوعی پشهٔ ریز؛ ٢) شانهٔ پودکوبی.
**هەپوُك:** پەپو سلێمانە ف هُدهُد، شانه‌بسر.
**هەپۆلە:** حەپۆل، زرتەزەلامی نەزان ف لندهور نفهم.
**هەپە:** ١) کەرکیت، هەپك؛ ٢) سەرمژانە؛ ٣) فریو، خەڵەتان؛ ٤) حەپە، عەف، حەپ؛ ٥) ئەو شوێنەی جلکی پێدادەکەن ف ١) شانهٔ پودکوبی؛ ٢) ابزاری در خیش؛ ٣) فریب؛ ٤) واق سگ؛ ٥) رخت‌آویز.
**هەپەنان:** خاپاندن، فریودان ف فریب دادن.
**هەپی:** هەپ، خواردن لە زمانی منالاندا ف خوردنی در لهجهٔ کودکان.
**هەپێ:** وتەی بانگ‌کردنی زارۆك بۆ خواردن، بخۆ ف بخور به زبان کودکانه.
**هەپیلۆك:** بێ‌فەڕ، خوێڕی ف بی‌عرضه.
**هەت:** ١) وتەی دنەدانی سەگ؛ ٢) ئازادکردنی بێچو لە مژینی دایك؛ ٣) نك، جەم، کن ف ١) کلمهٔ برانگیختن سگ؛ ٢) آزادی بچهٔ دام برای شیرمکیدن؛ ٣) نزد، پیش.
**هەتا:** ١) ئەو سەری ماوەو نێوان: (لێرە **هەتا** ئەوێ دو بستە)؛ ٢) وتەی مەرج‌دانان: (**هەتا** نەیەی نایەم)؛ ٣) بۆ ئەوەی: (کارم کرد **هەتا** نەیژی کارناکا)؛ ٤) بێ‌بڕانەوە: (**هەتا هەتایە** قسەت دەگەڵ ناکەم)؛ ٥) تا وەختێ: (**هەتا** تۆم ئاشنا بوُی ئاشنا بوُن/ ئەوێستا موُبەموُ ئەغیارە بێ تۆ) «کوردی» ف ١) حتّیٰ، تا؛ ٢) حرف شرط؛ ٣) تااینکه، برای اینکه؛ ٤) ابد، همیشه؛ ٥) تا وقتی.
**هەتار:** ١) کوتکی گەورە؛ ٢) تاوێر، بەردی زلی گلارەوەبوُگ لە کێف ف ١) پُتك گچ‌کوبی؛ ٢) صخرهٔ غلتان از کوه.
**هەتارەك:** لە نەورۆزدا زارۆك نێژنی، واتا: ئاگرۆکە ف اصطلاحی که در جشن نوروز گفته می‌شود.
**هەتاسەر:** هەمیشە: (دنیا **هەتاسەر** هەر وا نابێ) ف همیشه.
**هەتاڤ:** تیشکی خۆر، تاو ف تابش خورشید، آفتاب.
**هەتاکو:** ١) لێرە تا ئەوێ، هەتا؛ ٢) تا ئەمەی: (**هەتاکو** نەیەی نایەم)؛ ٣) تا ئەودەمەی: (**هەتاکو** پار هەر دەهات) ف ١) تا آنجا؛ ٢) شرط این است؛ ٣) تا آن هنگام.
**هەتاکونێ:** هەتاکو ف نگا: هەتاکو.
**هەتاکوێ:** تاکام‌جێ؟ ف تاکجا؟.
**هەتاکینێ:** هەتاکو ف نگا: هەتاکو.
**هەتان:** ١) تامان، چەپەر، تەیمان؛ ٢) تاوەکو، هەتاکو؛ ٣) تا ئەم ئەندازە؛ ٤) هێشتا بێتە سەری ف ١) در یا دیوارِ از ترکه بافته شده؛ ٢) تااینکه؛ ٣) تا این اندازه؛ ٤) هنوز بیشتر، بازهم افزونتر.
هەتانا: ١) تا ئەم ئەندازە؛ ٢) هێشتا بێتە سەری؛ ٣) تاکو ف ١) تا این اندازه؛ ٢) بازهم بیشتر؛ ٣) تا اینکه.
**هەتاناك:** ئەم اندازە کەمە ف این مقدار کم.
**هەتانوها:** تائێستە ف تاکنون.
**هەتانهۆ:** هەتانوها ف تاکنون.
**هەتانە:** لاتان هەیە، شك‌دەبەن، ئێوە دێرن ف دارید.
**هەتانێ:** هەتاکو ف نگا: هەتاکو.
**هەتاو:** ١) تیشکی خۆر، خۆرەتاو؛ ٢) پەلە، لەز: (بە **هەتاوهات** و تێ‌پەڕی) ف ١) تابش خورشید، آفتاب؛ ٢) شتاب.
**هەتاوبردن:** تاوانگازبوُن، تاوبردن ف آفتابزدگی.
**هەتاوبردو:** تاوانگاز ف آفتابزده.
**هەتاوبردە:** تاوانگاز ف آفتابزده.
**هەتاوکەفتن:** خۆرهاتن، زەردەی بەیان ف آفتاب برآمدن.
**هەتاوکەوتن:** هەتاوکەفتن ف آفتاب برآمدن.
**هەتاوگاز:** تاوانگاز، هەتاوبردە ف آفتابزده.
**هەتاوەك:** ١) تا بەوێنەی؛ ٢) کەمێ لە زەمان، تاوێك ف ١) تابه‌گونهٔ؛ ٢) مدّت کوتاهی.
هەتاوەکو: هەتاکو ف تااینکه.
**هەتاوەکوُنێ:** هەتاوەکو، هەتاکو ف تااینکه.
**هەتاوەکی:** هەتاوەك ف نگا: هەتاوەك.
**هەتاوەکینێ:** وتەی مەرج، تا ف تااینکه.
**هەتاوی کورد:** گۆڤارێکی تورکی و کوردی بو سالی ١٩١٠و ١٩١١ لە ئەستەموُڵ دەردەچو ف نام مجلّه‌ای.
**هەتاهەتا:** بێ‌بڕانەوەی دەم و کات ف اَبَد، تاابد.
**هەتاهەتایە:** هەتاهەتا ف تاابد.
**هەتاهەتایی:** تا سەر، بێ بڕانەوەی کات ف ابدی، تابی‌نهایت زمان.
**هەتبا:** بت‌بوایە ف اگر داشتی.
**هەتبان:** ئی ئێوە بوُنا ف اگر آنها را داشتی.
**هەتتە:** وتەی کەرئاژۆتن ف کلمهٔ راندن الاغ.
**هەتدان:** ١) دنەدانی سەگ، کس‌کس؛ ٢) بەرەڵاکردنی بێچو بۆ

مژینی دایك: (بێچوەکان **هەتدە** با بمژن) ف ١) برانگیختن سگ؛ ٢) آزاد کردن بچهٔ دام برای شیرخوردن.

**هەترش:** گوندێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد ف نام روستایی در کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**هەترە:** ١) بازرە، تەرە؛ ٢) سەرو بەر کردنی گوللەو تیر: (**هەترەی** کرد لێی نەدا)؛ ٣) ورە، ورار ف ١) رفتن بی برگشت؛ ٢) انحراف تیر از هدف؛ ٣) قوّت قلب، شجاعت.

**هەترەش:** ورە، نەترە، هەترە ف قوّت قلب، زهره، شجاعت.

**هەترەك:** هەتار، کوتکی بەردشکاندن ف پُتك بزرگ.

**هەترەگ:** پیری لەکارکەوتە ف پیرلکنته.

**هەتك:** ١) ناموُس، ئابڕو: (**هەتکی** بردم)؛ ٢) سوُکایەتی بەسەرهێنان: (**هەتکی** کردم)؛ ٣) ئابڕوچوُن ف ١) آبرو؛ ٢) آبروبردن، بی‌آبروکردن؛ ٣) آبرورفتن.

**هەتکاندن:** ئابڕوبردن ف آبروبردن.

**هەتك کردن:** هەتکاندن ف آبروبردن.

**هەتکی:** ئابڕوڕژاو ف آبرورفته، بی‌آبرو.

**هەتکیایش:** ئابڕونەماو، ئابڕوبراو ف آبرورفته.

**هەتلە:** ١) ڕەویو، هەڵوەدا؛ ٢) ڕێ‌لێ‌گۆڕاو ف ١) رمیده؛ ٢) گمراه، منحرف از راه.

**هەتمچە:** نانەجیبی خوێڕی‌و بێ‌ئابڕو ف ناکس بچه، پست.

**هەتمچەرەك:** هەتمچە ف ناکس بچه.

**هەتمچەرەکی:** نانەجیبی، خوێڕیایەتی ف دنائت.

**هەتوان:** مەڵحەم، دەرمانێ کە دەبرینی دەساون ف مرهم.

**هەتوتە:** هەتوُتە ف نگا: هەتوُتە.

**هەتوُتە:** مێخەکبەندو شتی بۆن‌خۆش کە بە جلکیەوە دەدروُن ف چیز خوشبو که بر لباس دوزند.

**هەتوُڵ:** وتەی سەرەتای کایەی حللوربلوُرە ف اصطلاحی در بازی کودکانهٔ اَتَل مَتَل.

**هەتوُڵ مەتوُڵ:** حللوُربللوُر، کایەی منالانە لاق دەخەنە ناو لاقی یەکترو درێژی دەکەن هەرکامێك نۆرەی هات‌و دەست لە لاقی درا دەبێ لاقی بکێشێتەوە دواوە ف نوعی بازی کودکانه، اَتل مَتل.

**هەتە:** ١) تۆ خاوەنی ئەوشتەی: (پوُڵە؟ **هەتە**، ماڵە؟ **هەتە**، ئەگەر **هەتە** بمدەیە)؛ ٢) هەتە؛ ٣) نك، جەم، کن ف ١) داری؛ ٢) کلمهٔ راندن الاغ؛ ٣) نزد.

**هەتەر:** ١) مەودای حوکمی چاو: (چاوم **هەتەری** لێ ناکا، تا چاو **هەتەر** دەکا دەشتە)؛ ٢) سەرو بەر کردنی تیر، وەئامانج نەکەوتن: (تیرم **هەتەر** ناکا، گوللە **هەتەری** کرد)؛ ٣) سوُر لەسەر مەبەست؛ ٤) ئاگر؛ ٥) مەودای تیرگەیشتنێ ف ١) بُرد دید؛ ٢) خطا رفتن تیر؛ ٣) پافشار مُصِر؛ ٤) آتش؛ ٥) تیررس.

**هەتەرێ:** وشەیەکە لە نەورۆزانە دەگوترێ بەمانا ئەی ئاگر، ئاگرانە ف ای آتش.

**هەتەق:** وتەیەکە بۆ گاڵتە بەدرۆکردن، درۆیە: (**هەتەق** لەو قسەڕاستە!!) ف اصطلاحی برای مسخره‌کردن سخن دروغ.

**هەتەك:** ١) ئاتەگ، داوێنی کەوا؛ ٢) نیفۆکی دەرپێ؛ ٣) هاواڵ، هاوڕێ؛ ٤) تەك، نزیك، لا ف ١) دامن قبا؛ ٢) خِشتك شلوار؛ ٣) رفیق، همراه؛ ٤) نزد.

**هەتەتوُك:** هەتوُتە ف نگا: هەتوُتە.

**هەتی:** ١) سوُکەڵەی هەتیو، وتەیەکە بۆ گەف: (**هەتی** دەتکوژم)؛ ٢) لە دۆستایەتی‌دا دەڵێن: (**هەتی** بڕوانە، ئای **هەتی** مامە لەو شێرەی) ف ١) کلمه‌ای تهدیدآمیز؛ ٢) خطابی دوستانه.

**هەتیتە:** پارچەپوُلایەکی کون‌کونە زێڕینگەران تاڵەزێڕی پێ دەگوشن‌و ڕاست دەکەنەوە ف شفشاهنج، از ابزار زرگری.

**هەتیم:** ١) سێوی، بێ باب‌و داك؛ ٢) هەتی ف ١) یتیم؛ ٢) نگا: هەتی.

**تیمچە:** ١) هەتمچە؛ ٢) چێشتێکە بە سێب‌زەمینی‌و پیوازو تەماتەو باینجان ساز دەکرێ ف ١) ناکس بچه؛ ٢) غذایی است مرکّب از سیب‌زمینی و پیاز و گوجه‌فرنگی و بادمجان.

**هەتیو:** ١) سێوی؛ ٢) هەتی ف ١) یتیم؛ ٢) نگا: هەتی.

**هەتیوبار:** بێوەژنی خاوەن منالی ورد ف بیوهٔ بچه‌دار، مادر یتیمان.

**هەتیوباری:** ١) حاڵی هەتیوبار؛ ٢) برێتی لە نەداری‌و فەقیری ژنی بێ‌مێرد ف ١) حالت بیوهٔ مادریتیمان؛ ٢) کنایه از بینوایی بیوه.

**هەتیوباز:** منالباز، بەچەباز ف بچه‌باز.

**هەتیوبوُن:** باب‌و داك مردن ف یتیم شدن.

**هەتیوچە:** هەتمچە ف ناکس بچه.

**هەتیوخانە:** جێگەی بەخێوکردنی سێویان ف پرورشگاه ایتام.

**هەتیوکەوتن:** هەتیوبوُن ف یتیم شدن.

**هەتیومچ:** هەتمچە ف ناکس بچه.

**هەتیومەتیو:** ڕوُتەو پوُتە، ڕوُت‌و ڕەجال ف اوباش.

**هەتیوە:** ١) وتەی گەف بە سوُکایەتیەوە، هەتی: (**هەتیوە** دەتکوژم)؛ ٢) بە گاڵتەوە دواندنی هاواڵ، هەتی: (**هەتیوە** بزانە چەند خۆشە)؛ ٣) چەلاکی باریکی چادر کە بەر دیرەگی دەدەن؛ ٤) نیسکێنەی توندی بێ‌ڕۆن؛ ٥) تەختەکوێنی کەنارەی ڕەشماڵ کە شۆڕدەبێتەوە ف ١) کلمهٔ تهدید تحقیرآمیز؛ ٢) خطاب میان دودوست صمیمی بدون قید وقیود؛ ٣) ستونك پشتیبانهٔ دیرك چادر؛ ٤) آش عدس غلیظ و بی‌روغن؛ ٥) قطعهٔ آویزان از کنار سیاه چادر.

**هەتیوی:** ژیانی بەبێ باب‌و داك ف یتیم بودن.

**هەجاس:** ناوبژیکەر ف میانجی.

**هەجاسی:** ناوبژی‌کردن ف میانجیگری.

**هەجان:** ١) هۆزێکی کوردە لە بادینانی کوردستان؛ ٢) کوُپ کە بۆ لەش ڕەق‌بوُن دەکاری دێنن ف ١) نام ایلی در کردستان؛ ٢) بادکش.

**هەجانکەر:** کەسێ کە کوُپ لە لەش دەگرێ ف بادکش‌گیر.

**هەجب:** فڕ، فڕپێ‌دادان، خراوگوتن ف بدگویی، هجو.

**هەجناندن:** داهێزان، هەجنین ف احساس سستی در اندام.

**هەجنین:** داهێزان، لەش گران‌بوُن ف احساس سُستی در اندام.

**هەجو:** هەجب، فڕ ف بدگویی، هجو.

**هەجوج:** ئاجوج، عاجوج، هاجوج، هاوالّی باجوج ف یأجوج.
**هەجوجك:** توّوی هارمیّ ف تخم گلابی.
**هەجەت:** ۱) حاجەت، ئەسباب، ئامیّر، ئامراز؛ ۲) بریتی لە کیّر ف ۱) ابزار، وسیله؛ ۲) کنایه از آلت تناسلی نرینه.
**هەجەجك:** هاجی‌رەشك، پەرەسیّلکەی رەش کە لەمالاّندا هیّلین چیّ دکە ف چلچله.
**هەجەر:** گوّرستان ف مقبره.
**هەجەل:** ۱) دەمی دیاری کراو: (ئەم قەرزەت بە **هەجەلی** دومانگ دەدەمیّ)؛ ۲) ئاکامی مەرگ ف ۱) وقت معیّن؛ ۲) اجل.
**هەجەمات:** حەجامات، کەلّەشاخ گرتن ف حجامت.
**هەجهەجك:** پەرەسیّلکەی ئاومالاّن، حاجی‌رەشك ف چلچله.
**هەجی:** حاجی ف حاجّ.
**هەچ:** ئیشارە بوّ گشتی ناونەبر: (بە **هەچ** لایەکا برّوا، **هەچ** کەس بیّ) ف هرچه یا هرکس.
**هەچا:** ۱) پیّرا؛ ۲) پیّکەوە ف ۱) بەوسیلهٔ؛ ۲) باهم.
**هەچچە:** هەتتە ف کلمهٔ راندن الاغ.
**هەچك:** ئاڵقەی سەری گوریسی باربەند ف حلقهٔ سر رسن باربند، وهنگ.
**هەچکوّ:** هەر ئیّژی، وەك ئەوە وایە ف مثل اینکه، تو گویی.
**هەچکوج:** میّوژ ف مویز.
**هەچکوچی:** مەویژ، میّوژ، میّویژ ف مویز.
**هەچە:** ۱) کەری سواری: (مامەگیان سواری **هەچەم** ناکەی؟)؛ ۲) وتەی ئاژوّتنی کەر ف ۱) الاغ سواری؛ ۲) کلمهٔ راندن الاغ.
**هەچەل:** ۱) هەچك؛ ۲) چەتوّن، کاری دژوار ف ۱) وهنگ؛ ۲) مشکل.
**هەچەهەج:** ۱) دوپاتە لەدوی یەك گوتنی هەچە؛ ۲) بریتی لە قسەی زوّر بیّ‌تام ف ۱) کلمهٔ راندن الاغ؛ ۲) کنایه از یاوه‌گویی.
**هەچی:** ۱) کیّ بیّ، چی بیّ؛ ۲) هەرچەندی: (**هەچی** بمدەنی دەمەویّ)؛ ۳) هەچك ف ۱) هرکس یا هرچه؛ ۲) هرچند، هرچقدر؛ ۳) وهنگ.
**هەچیّکم:** گشت شتیّ سەر بە من: (**هەچیّکم** بو دامیّ) ف هرچیز که من.
**هەچیم:** هەچیّکم ف هرچیز که من.
**هەد:** ۱) حەد: (**هەدیّ** وی چیه ببە زاڤایێ من)؛ ۲) سنوور؛ ۳) ئەندازە: (لە **هەد** دەرچوە) ف ۱) حدّ لیاقت، شایستگی؛ ۲) مرز؛ ۳) اندازه.
**هەدا:** ۱) ئوّقره، ئارام، سەکنین؛ ۲) پیّکەوە، هەچا ف ۱) آرام؛ ۲) باهم.
**هەدادان:** داسەکنین، ئارام‌گرتن ف آرام گرفتن.
**هەدار:** ۱) هەدا، ئوّقره؛ ۲) کەسیّ بە پارە کوّمەك بە خەلّك دەکا؛ ۳) دارایی؛ ۴) بەخت؛ ۵) زرینگ، وشیار: (کوّچکیّ مە زەهف **هەدارە**) ف ۱) آرام؛ ۲) نیکوکار، کمك‌کنندهٔ مالی؛ ۳) دارایی؛ ۴) بخت؛ ۵) زرنگ، هوشیار.
**هەداری:** ۱) دەسگیروّیی، کوّمەگی پارە؛ ۲) خاترجەمی؛ ۳) سەبووری‌هاتن ف ۱) کمك مالی؛ ۲) آسودگی خاطر؛ ۳) تسکین خاطر.
**هەدان:** ۱) ئوّقره، داسەکنان؛ ۲) نیشانەی پرسیار،؟؛ ۳) گومان ف ۱) آرام، قرار؛ ۲) علامت سؤال؛ ۳) شكّ، گمان.
**هەدد:** بەردی قەبر ف سنگ قبر.
**هەدراندن:** هەداپیّ‌دان، داسەکناندن ف آرام کردن.
**هەدراندی:** ئوّقره‌گرتو ف آرام گرفته.
**هەدره:** ۱) لە ئازەحەتیان مردن؛ ۲) ئامادەی کار، چاپك، چالاك ف ۱) از شدت ناراحتی مردن؛ ۲) چابك.
**هەدرین:** دامرکان، داسەکنین، ئوّقره‌گرتن ف آرام گرفتن.
**هەدناندن:** خاترجەم‌کردن ف اطمینان خاطر بخشیدن.
**هەدەر:** فیرّوّ ف ضایع، هدر.
**هەدەف:** ۱) تەپوّلکە؛ ۲) ئامانج؛ ۳) دوّزو مەبەست ف ۱) تپهٔ کوچك؛ ۲) هدف؛ ۳) مرام، مقصود.
**هەدی:** کەی وایە؟ ف کی چنین است؟.
**هەدیایش:** هەدادان، ئوّقره‌گرتن، ئارام‌بوون ف آرام گرفتن.
**هەدیداندن:** هەرەشەکردن، گەف‌کردن ف تهدیدکردن.
**هەدیە:** دیاری، سەوقات ف ارمغان.
**هەر:** ۱) تەنیا: (**هەر** خوّت وەره)؛ ۲) بەشوێن یەکا: (**هەر** هات و **هەر** دیّت)؛ ۳) دایم: (**هەر** هەبی، **هەر** خوّش بی)؛ ۴) بیّ‌گومان: (مەترسە **هەر** دیّم بوّ ماڵتان)؛ ۵) چوّنەکایی بیّت: (**هەر** بمدەیە جا بزانە چی‌دەکەم)؛ ۶) ئەگەر: (**هەر** بیخوّی دەزانی چیه)؛ ۷) بیّ‌درەنگ: (**هەر** هات ملی نا لە جویّن‌دان)؛ ۸) هەچ، هەمو: (**هەرگا**، **هەرکەس**، **هەرچی**)؛ ۹) کەر، گوێرێژ؛ ۱۰) هەقمەق؛ ۱۱) بەفیز؛ ۱۲) خاك ف ۱) فقط؛ ۲) نشانهٔ توالی واستمرار؛ ۳) همیشه؛ ۴) حتماً؛ ۵) درهرحال؛ ۶) اگر؛ ۷) فوراً؛ ۸) همه را شامل شود، هر؛ ۹) خر، الاغ؛ ۱۰) احمق؛ ۱۱) متکبّر؛ ۱۲) خاك.
**هەرِ:** ۱) حەری، قوڕ؛ ۲) زیقە، گریانی منداڵ؛ ۳) زەرەی کەر، گوره؛ ۴) خاك، خوّل ف ۱) گِل؛ ۲) صدای گریهٔ بچه؛ ۳) عرعر الاغ؛ ۴) خاك.
**هەرا:** ۱) گیرەو کیّشە، پشیّوی؛ ۲) بانگ، قاو؛ ۳) هەراو، پان، گوشاد؛ ۴) دوور، دژی نزیك ف ۱) آشوب و هنگامه؛ ۲) ندا، صدای بلند؛ ۳) فراخ، گشاد؛ ۴) دور.
**هەڕا:** غار، رِا، قاچان ف دو، گریز.
**هەڕاج:** حەراج ف حراج.
**هەڕاج کردن:** شت‌فروّشتن لەناو خەڵکا کیّ نرخی پتری پیّ‌بدا بوّ ئەو بیّ ف حراج کردن.
**هەڕاجەبازار:** حەراجەبازار ف بازار حراج.
**هەرادیای:** تەواوبوون، تەمامیای ف تمام شدن.
**هەڕاز:** هاتوچوّ لە جوّلاّنەدا ف نوسان، آمدورفت در تاب.
**هەڕازگە:** جوّلاّنە ف تاب.
**هەراژ:** ۱) رشانەوە، وەرِشین؛ ۲) قرِیی رِشانەوە ف ۱) قی؛ ۲) تهوّع.
**هەڕاژ:** هەڕاج ف حراج.
**هەراس:** ۱) ئیسراحەت و ئارامی: (**هەراسی** پیّ‌هەڵگرتوم)؛ ۲) جارِز، وەرِەز؛ ۳) ترس ف ۱) آرامش و قرار؛ ۲) پکر؛ ۳) ترس.

**هەراسان:** جاڕز، وەڕەز ف پکر.

**هەراسە:** ۱) ترس، خۆف؛ ۲) داوەڵ، داهۆڵ ف ۱) بیم، هراس؛ ۲) مترسك.

**هەراش:** ۱) لەگەشـە، بەگەشـە؛ ۲) هەراژ؛ ۳) گەڵاو چڵوی کە بەسەر دارەڕای دادەن، ئاڵاش؛ ۴) لەبـەریەك هەڵوەشاو، ریزاڵ: (گۆشتەکە **هەراش هەراش** بو) ف ۱) بالنـده، نمـوکـرده؛ ۲) تهوّع و قی؛ ۳) انبیره، پوشال روی سقف؛ ۴) ازهم گسیخته، ازهم پاشیده.

**هەراش‌ناوس:** ناوسی نزیك بە زان ف آبستن نزدیك به زایمان.

**هەراش‌بوْن:** ۱) گەشـەکـردن: (بـەرخەکە **هەراشە**، شیناوەرد **هەراش** بوە)؛ ۲) لیـك‌بلاوبـوْن ف ۱) شکوفـاشدن، بالنده‌شدن؛ ۲) ازهم پاشیدن.

**هەراش‌هەراش:** لەبـەریەك بلاوبـوْگ: (گۆشتـەکـە ئەوەنـدە کوڵیوە **هەراش‌هەراش** بوە) ف ازهم پاشیده.

**هەراشە:** نەخۆشیەکی دەخڵە کە زۆرواوەو بارانی نەبوە ف از بیماریهای غلات از بی‌آبی.

**هەڕافتن:** ۱) ڕوْخان، تێك‌ڕوْخان، رمان؛ ۲) ڕوْخاندن ف ۱) فروریختن دیوار و...؛ ۲) فروریزاندن.

**هەراقستش:** دوْرکەوتنەوە ف دورافتادن.

**هەراکـردن:** ۱) قاوکردن، دەنگ‌بەرزکردنەوە؛ ۲) کێشەو گێرەکردن ف ۱) صدا بلند کردن، بانگ برآوردن؛ ۲) مجادله‌کردن.

**هەڕاکردن:** غاردان، راکردن ف دویدن، گریختن.

**هەڕاڵـە:** ۱) شکـوفە، کلۆك، کوڵوك، پشکۆژ؛ ۲) جاڕ، بانگاواز ف ۱) شکوفهٔ درخت؛ ۲) ندا در دادن، جار.

**هەرام:** حەرام، ناڕەوا ف ناروا.

**هەرامزا:** حەرامزادە، بیژی، بیژو، پیچ ف حرامزاده.

**هەرامزادە:** هەرامزا، بیژو ف حرامزاده.

**هەراموەر:** حەرام‌خۆر ف حرام‌خوار.

**هەرامە:** ۱) وانێك، واك، وانەك، ئەوتشت، هین؛ ۲) کامە، کێهە؟ ف ۱) آن چیز؛ ۲) کدام، کدامین؟.

**هەران:** کۆمەڵەکەر ف خران.

**هەرانانەوە:** کێشەسازکردن، ئاژاوەنانەوە ف آشوب بەپا کردن.

**هەڕانن:** زەڕاندن ف عرعرکشیدن.

**هەرانە:** بەفیز، کەرانە، لەخۆبایی ف متکبّر، مغرور.

**هەراو:** گوشاد، فرەهـ ف گشاده، گشاد.

**هەراوزەنا:** چەقەو گوڕە، زەنازەنا ف جنجال و هیاهو.

**هەراوهوریا:** هەراوزەنا ف جنجال و هیاهو.

**هەراهەرا:** قاوەقاو، قیڕەقیڕ ف سر وصدا.

**هەرایەر:** دوْرتر و دوْرتر، هەر دوْرتر ف دور و دورتر.

**هەرایەی:** هەراوی، پان‌و بەرینی ف فراخی، گشادی.

**هەرایی:** پانایی، بەرینایی ف عرض، پهنا، گشادی.

**هەربزە:** گندۆرە ف خربزه.

**هەربل:** ۱) هەبل؛ ۲) ئاڵۆزی‌و تێك‌هالاوی ف ۱) نگا: هەبل؛ ۲) درهم برهمی.

**هەربـلانـدن:** ۱) ئاڵۆزکردنی ڕیس؛ ۲) بریتی لە ئاڵۆزکردنی کار؛ ۳) خاپاندن ف ۱) سردرگم کردن رشته؛ ۲) کنایه از بهم ریختن کار؛ ۳) فریب دادن.

**هەربلین:** ۱) هەبلین؛ ۲) فریوخواردن ف ۱) نگا: هەبلین؛ ۲) فریب خوردن.

**هەربو:** بێ‌پێشینە، هەمیشە خاوەنی بوْد ف ازلی، پایندهٔ بی‌آغاز.

**هەربوْگ:** هەر بو ف نگا: هەربو.

**هەربوْگە:** دایم بوە، نەبوْنی نەدیوە ف همیشه بوده.

**هەربوْنی:** نەمری، بێ‌پێشوْنە ف جاودانی، پایندگی.

**هەربەنە:** کەردار، چاروێدار، خەربەندە ف چاروادار.

**هەربی:** بەئاشکرا، رەپ‌و ڕاست ف بی‌پرده، رك.

**هەربینا:** هەبینا، بەوزوانە، لەناکاو ف به همین زودی.

**هەرپلە:** وڕاوە، ڕاوە، قسەپەڕاندن ف هذیان.

**هەرت:** ۱) وتـەی گەڕانـدنـەوەی گاجـوْت لە خەتی جوْتـا؛ ۲) ناوی دەشتێکە لە کوردستان ف ۱) کلمه‌ای برای بازگرداندن گاو در شیار شخم؛ ۲) نام دشتی در کردستان.

**هەرتا:** ۱) تەنیا بوْ ئەمەی؛ ۲) گش داویْ ف ۱) **فقط برای اینکه؛ ۲) هر نخی.**

**هەرتاك:** گش نێکیان ف هردانه، هرفرد.

**هەرتاکو:** تەنیا بوْ ئەمەی، هەرتا ف فقط برای اینکه.

**هەرتاوەکو:** هەرتاکو ف فقط برای اینکه.

**هەرتاوەکوْنێ:** هەرتاکو ف فقط برای اینکه.

**هەرت‌دانەوە:** زڤڕاندنی گا لە خەتی جوْت‌دا ف بازگرداندن گاو در شخم.

**هەرتشت:** ئەوی شتە بەگشتی: (**هەرتشت** بزراقی مروْڤ بستوری دێتە شکاندن) ف هرچیز.

**هەرتك:** دوەکان ف هردو.

**هەرتکان:** هەرتکی ئەوان ف هردوی آنها.

**هەرتکو:** ئێوە دوان ف هردوی شما.

**هەرتکیان:** دوانەکان پێکەوە: (**هەرتکیان** بابێن **هەرتکیانم** دەوێ) ف هردوی آنها با هم.

**هەرتم:** هەردەم، هەرگا، هەرگاف ف هرگاه.

**هەرتوْ:** تەنیا توْ ف فقط تو.

**هەرتوْش:** ولاتێکە لە کوردستان ف منطقه‌ای در کردستان.

**هەرتوْشی:** عەشیرەتێکە لە کوردستان ف عشیره‌ای در کردستان.

**هەرتـە:** ۱) وتـەی زڤـڕانـدنی گا لە جوْتـا، هەرت؛ ۲) هەرتـوْ؛ ۳) لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف ۱) کلمهٔ برگرداندن گاو در شیار شخم؛ ۲) تنها تو؛ ۳) روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**هەرتـەل:** گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**هەرتین:** ئاخ‌هەڵکێشان لە عەزرەتان ف آه حسرت کشیدن.

**هەرجا:** لە جێگەی خۆی، قەیدی نیە: (فەرمایشتەکەت بە **هەرجا** بەڵام من نێژم) ف بەجای خودش.

**هەرجار:** گش دەحفەیێ ف هر بار.

**هەرجارەکی:** ۱) هەرجار؛ ۲) هەر تەنیا جارێك ف ۱) هر بار؛ ۲) فقط یکبار.

**هەرجایی:** ۱) گەڕیدەو ماڵانگەڕ؛ ۲) گوڵێکە لە وەنەوشە دەکا ف ۱) ولگرد؛ ۲) گلی است شبیه بنفشه.

**هەرجن:** بادامەتاڵە ف بادام تلخ کوهی.

**هەرجو:** تکا، ئەرجو، خوایشت، مەهدەر ف خواهش.

**هەرجۆر:** چۆناوچۆن بێت ف هرطور.

**هەرجوُر:** هەرجۆر ف هرطور.

**هەرجێ:** کام شوێن بێت ف هرکجا.

**هەرچاخ:** هەردەم ف هرگاه.

**هەرچاوا:** هەرچلۆنێك ف هرطور.

**هەرچشت:** هەرتشت ف هرچیز.

**هەرچقاس:** هەرچەند ف هرچند.

**هەرچقاش:** هەرچەند ف هرچند.

**هەرچڵە:** ۱) چەرخ‌و دارو بارێ کە بەرداشی پێ دەگوێزنەوە؛ ۲) گش‌یەك لە لقەکان: (ریحانەم هەیە **هەرچڵەی** کوڕێ ئەژی) ف ۱) چرخ و چوبهای وسیلهٔ انتقال سنگ آسیا؛ ۲) هرشاخه‌ای.

**هەرچم:** هەچیم ف هرچە من.

**هەرچۆن:** بە کام باردا، هەرجۆر ف هرطور.

**هەرچەن:** ۱) ئەوەندەی، ئەو ئەندازەی؛ ۲) ئەگەرچی ف ۱) هراندازە، هرچقدر؛ ۲) اگرچە.

**هەرچەند:** هەرچەن ف نگا: هەرچەن.

**هەرچەندژی:** ئەگەریش، دەگەڵ ئەوەشا ف بااینکه.

**هەرچەندە:** هەرچەن ف نگا: هەرچەن.

**هەرچی:** ۱) هەرتشت؛ ۲) هەرچەند؛ ۳) خوێڕی‌و بێ‌نرخ: (**هەرچی‌و پەرچی**) ف ۱) هرچیز؛ ۲) هراندازە؛ ۳) ناچیز، بی‌ارزش.

**هەرچی‌چۆنێ:** لە هەربارێك‌دا: (**هەرچی‌چۆنێ** بێ ڕامان‌بواردوە) ف بەهرجهت، درهرحال.

**هەرچیکۆ:** هەرچەن ف نگا: هەرچەن.

**هەرچیم:** هەچیم ف هرچەمن، هرچە مرا.

**هەرچی‌پەرچی:** بنیادەمی خوێڕیو بەرەڵدا ف اوباش.

**هەرچی‌و پەرچی:** هەرچی‌پەرچی ف اوباش.

**هەرچێوە:** ۱) هەرتشتێ؛ ۲) هەرچەند ف ۱) هرچیز؛ ۲) هراندازە.

**هەرحاڵ:** هەرهال، هەرچۆنێ بێت ف درهرحال، هرطور کە باشد.

**هەرخستن:** ۱) وەبەرتاودان بۆ وشك‌بوُنەوە؛ ۲) گوێ‌ڕاگرتن بۆ بیستن ف ۱) پهن کردن در آفتاب؛ ۲) گوش فرادادن برای شنیدن.

**هەرخۆت:** ۱) تەنیا تۆ؛ ۲) ئەرخۆت، لوڵەپی مەشکە ف ۱) تنها خودت؛ ۲) چوب دستگیرهٔ مشک.

**هەرد:** ۱) عەرد، زەمین؛ ۲) شاخی سەخت‌و پڕ بەرد؛ ۳) هەرتك ف ۱) زمین؛ ۲) کوە سنگی و سخت؛ ۳) هردو.

**هەڕد:** ۱) ئارد؛ ۲) هاڕاو ف ۱) آرد؛ ۲) خردشدە، گردشدە.

**هەرداندن:** توُڕەکردن، سڵ‌کردن، خەیداندن ف خشمگین کردن.

**هەردك:** هەرتك ف هردو.

**هەردن:** گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**هەردو:** هەرتك ف هردو.

**هەردوُك:** هەرتك ف هردو.

**هەردوکان:** هەرتکان ف هردوی آنها.

**هەردونە:** ناوی دوگوندی کوردستان کە بەعسی وێرانی کردن ف نام دو روستای کردستان کە بعثیان ویران کردند.

**هەردە:** ۱) خوارن، خۆراك؛ ۲) ساراو چۆل، بیاوان؛ ۳) زورکان، دەشتی بەگردولکە؛ ۴) تەرەو چۆلگەرد؛ ۵) وەك، لە چەشنی: (**هەردە جارانِ**) ف ۱) خوردن، خوراك؛ ۲) بیابان؛ ۳) دشت پرتپە ماهور؛ ۴) خُل بیابانگرد؛ ۵) مانند، مثل.

**هەردەبانان:** کۆساران ف کوهساران.

**هەردەبیر:** وازوازی ف متردّد، دمدمی.

**هەردەجاران:** ڕۆژگارانی پێشین ف درزمانهای گذشتە.

**هەردەر:** هەرکوێ، هەرجێ‌یە ف هرکجا.

**هەردەگێڵ:** چۆلگەرد ف ویلان و آوارهٔ بیابان.

**هەردەم:** ۱) گش وەخت؛ ۲) لە کام وەختا ف ۱) هردم، همیشە؛ ۲) هرگاه.

**هەردەمی:** وازوازی، هەردەبیر ف متردّد، دمدمی.

**هەردەن:** خواردن، خارن ف خوردن.

**هەردەنی:** خواردەمەنی، شیاوی خواردن ف خوردنی.

**هەردی:** خەڵکی کێوپارە ف کوهستانی.

**هەردیسە:** ئەڕدێن، ردێن، ریش، موی بان چەنەو چڕو چاو ف ریش.

**هەردین:** قەڵس‌بوُن، سڵ، خەیدین ف خشمگین شدن.

**هەڕدین:** لەبەریەك بڵاوبوُن لەبەر کوڵین: (گۆشت **هەڕدیە**) ف از هم پاشیدن در اثر پختن.

**هەردینان:** هەردوکیان ف هردوی آنها.

**هەررك:** وشەیەکە بۆ سەیرمان‌و واق‌وڕمان ف کلمهٔ تعجّب.

**هەررۆ:** گش ڕۆژێ ف هر روز.

**هەررۆژ:** هەررۆ ف هر روز.

**هەررۆژی:** ڕۆژانە، هەموڕۆژێك ف روزانە، همەروزە.

**هەررۆیی:** هەررۆژی ف همەروزە.

**هەرز:** ۱) فیڕۆ، بەهیچێ‌چوُگ، خەسار؛ ۲) فریزو، فرێز؛ ۳) بژار، گیای بێ‌بەهرە ف ۱) ضایع، هدر؛ ۲) فریز؛ ۳) گیاه هرزە.

**هەرزا:** ۱) ناوچەیەکە لە کوردستان؛ ۲) ناوی عەشیرەتێکە ف ۱) ناحیه‌ای درکردستان؛ ۲) نام عشیره‌ای است.

**هەرزاڵ:** ۱) پێڕك؛ ۲) کەپری ناوڕەزو بێستان کە لەسەرویوە چاویان ا

هەموی بیٚ ف ١) سکوماندی از جوب برای اثاثیهٔ چادر؛ ٢) کلبهٔ باغ.

**هەرزالك:** هەرزاڵ ف نگا: هەرزاڵ.

**هەرزاڵـە:** ١) هەرزاڵ، پیٚرك؛ ٢) ریٚزەلە ف ١) سکوی اثاثیهٔ چادر؛ ٢) نگا: ریٚزەلە.

**هەرزان:** ١) کەمنرخ؛ ٢) بیٚبەزەیی ف ١) ارزان؛ ٢) بی‌لطف.

**هەرزانبایی:** کەمنرخ ف ارزان قیمت.

**هەرزانفرۆش:** ١) شتفروشتن بە نرخی کەم؛ ٢) کەسیٚ کە شت بە نرخی کەم دەفروشیٚ ف ١) جنس ارزان فروختن؛ ٢) کسی کە ارزان می‌فروشد.

**هەرزان کڕ:** ١) بریٚتـی لە فەقیرو نەدار؛ ٢) بریٚتی لە چروك‌و ڕژد ف ١) کنایە از بینوا؛ ٢) کنایە از خسیس.

**هەرزانی:** ساڵی خۆش‌و پڕ بەرەکەت ف سال نیکوی پرحاصل.

**هەرزبوٗن:** بەفیرۆچوٗن، زایەبوٗن ف بەهدررفتن.

**هەرزل:** ئەنگوتکەهەویری پچوٗك ف چونهٔ کوچك خمیر.

**هەرزڵ:** پواوی لەبـەریەك‌چوٗگ، رزیوی هیچ بەسەر هیچەوە نەماو ف پوسیدهٔ ازهم دررفتە.

**هەرزەلە:** دو گوندی کوردستانن بەعسی ویٚرانی کردن ف دو روستای کردستان کە بعثیان ویران کردند.

**هەرزڵ هەرزڵ:** تەواو پواو ف تمام پوسیدە و از کار افتادە.

**هەرزن:** دانــەویٚڵەیەکی سوٗری زۆر وردە بژیوە دەکـریٚتـە نان. زۆرتـر *خواردنی مامرو مەلە*، باچیك ف ارزن.

**هەرزنـە:** ١) خونچـەی گوڵی ڕەز؛ ٢) گیایەکی بژارە لە توتن‌دا ف ١) غنچهٔ شکوفهٔ تاك؛ ٢) گیاهی هرزە در کشتزار توتون.

**هەرزنەتاڵە:** جۆریٚ هەرزن کە تامی تاڵە، گاڵ ف ارزن تلخ، گال.

**هەرزنەکیٚویلە:** گیایەکە بەریٚکی وەك هەرزن دەگریٚ ف ارزن کوهی.

**هەرزنـەگـەورە:** گارس، هەرزنـەسپیلکـە کە بە هیٚشو دەبیٚ‌و دەنکی درشتە، زوراٚت ف گاورس.

**هەرزنەگیٚلۆش:** جۆریٚ هەرزن کە شکڵی لە گەنمەشامی دەکا ف نوعی ارزن با دانەهای مانند بلال.

**هەرزە:** ١) گیای بژار؛ ٢) بڵح‌و جلف؛ ٣) سەرسـەخت‌و لاسار ف ١) گیاه هرزە؛ ٢) سبکسر؛ ٣) خیرەسر.

**هەرزەبیٚژ:** چەنەباز، چەنەدریٚژ، چەڵتەباز ف وراّج.

**هەرزەچن:** بژارکەر ف وجین کنندە.

**هەرزەچەنە:** هەرزەبیٚژ ف وراّج.

**هەرزەکار:** تازەلاوی موٗڵیٚ نەهاتو ف نوجوان.

**هەرزەکاری:** ڕۆژانی لاوی ف دوران نوجوانی.

**هەرزەگۆیی:** قسەی بیٚتام گوتن ف ژاژخایی.

**هەرزەڵ:** ١) هەرزاڵ، پیٚرك؛ ٢) کەپرەشینەی جوٗلەکان ف ١) سکوی چوبی در چادر، نگا: هەرزاڵ؛ ٢) جشن میوەبندان کلیمیان.

**هەرزەیی:** کاری سوٗك‌و بیٚئابڕویانە ف کار جلف و سبکسرانە.

**هەرزیل:** هەرزاڵ ف نگا: هەرزاڵ.

**هەرزین:** هەرزن ف ارزن.

**هەڕژانــدن:** ١) پڵیخــانــدنــەوە؛ ٢) لەنــاوبــردن، نەهیٚشتن؛ ٣) هەلابـەهەلاکردن؛ ٤) بیٚهوٗدە خەرج کردن، دەستبڵاوی نە لەجیٚی خۆی‌دا ف ١) لەکــردن؛ ٢) ازبین بردن؛ ٣) ازهم پاشیدن دراثــر جوشانیدن زیاد؛ ٤) اسراف، خرج بی‌معنی کردن.

**هەڕژین:** هەلاهەلابوٗن ف لەولوردە شدن در اثر جوشیدن زیاد.

**هەرس:** ١) ورچ، حەش؛ ٢) فرمیٚــسك، روٚنـدك، ئەسـر، ئەسرین؛ ٣) عەزرەت، تاسـە؛ ٤) نزگەرە؛ ٥) هەڵکیٚشـانی ئاخ ف ١) خرس؛ ٢) اشك؛ ٣) آرزو؛ ٤) سکسکە؛ ٥) آە کشیدن.

**هەڕستاندن:** ١) تیٚك‌شکاندن؛ ٢) وردوخاش کردن؛ ٣) پیٚ‌ڕیٚخستن؛ ٤) لە خەو بیٚدارکــردنـەوە؛ ٥) بڵنـدکـردن‌و ڕاوەستـانـدن ف ١) درهم شکستن؛ ٢) خرد و خمیرکردن؛ ٣) زیر پا لە کردن؛ ٤) ازخواب بیدار کردن؛ ٥) بلند کردن و برپا نگهداشتن.

**هەڕستن:** پاڵ‌ویٚکدان، لیٚك‌جوٗت‌بوٗن بە توندی، پیٚکەوەلکانی بیٚ نیٚوان ف محکم بە هم چسبیدن.

**هەڕستین:** ١) شکـانـدن؛ ٢) وردوخاش کردن؛ ٣) پیٚ‌ڕیٚخستن ف ١) شکستن؛ ٢) خردوخمیرکردن؛ ٣) زیر پا لە کردن.

**هەرسەك:** هەڵتاوین، تاواننەوەی خۆراك لە ورگ‌دا ف هضم، گوارش.

**هەرسی:** ئەسرین، روٚندك ف اشك.

**هەرسیٚ:** ١) ئیٚك دەگەڵ دوان پیٚکەوە؛ ٢) ورچیٚك ف ١) هرسە باهم؛ ٢) یك خرس.

**هەرسیڕشنایش:** فرمیٚسك‌ڕژاندن ف اشك ریختن.

**هەرسیك:** جرجەمشك ف موش کور.

**هەرسیٚك:** هەرسیٚ ف نگا: هەرسیٚ.

**هەرسیٚکان:** ئەو ئیٚك دەگەڵ دوەکە ف هرسەشان.

**هەرسیٚکیان:** ١) هەرسیٚکان؛ ٢) ورچیٚکیان ف ١) هرسەشان؛ ٢) یکی از خرسها.

**هەرسیل:** بەردی گۆشەی بناغەی دیوار ف سنگ شالودهٔ نبش دیوار.

**هەرسین:** ١) مەڵبەندیٚکە لە کوردستان؛ ٢) فرمیٚسکاوی ف ١) ناحیەای در کردستان؛ ٢) اشك‌آلود.

**هەرش:** ئەسرین، روٚندك، فرمیٚسك ف اشك.

**هەڕش:** ١) فیڕۆ، خۆرایی؛ ٢) مەزەختی بەفیڕۆ ف ١) هدر؛ ٢) اسراف.

**هەڕشان:** ١) لەبەریەك بڵاوبوٗن لەبەر کوڵان؛ ٢) پڵیخانەوە ف ١) ازهم پاشیدگی؛ ٢) لەشدن.

**هەڕشـاندن:** ١) لەبەریەك بڵاوکردن؛ ٢) پڵیخاندنەوە؛ ٣) هەرژاندن ف ١) ازهم پاشیدن؛ ٢) لەکردن؛ ٣) ازبین بردن.

**هەرشت:** هەرچتیٚ ف هرچیز.

**هەڕشتن:** هەڕشاندن ف نگا: هەڕشاندن.

**هەرشتە:** هەرشت ف هرچیزی.

**هەڕشتە:** ئاردەبەهاروی بە ئاوشیٚلدراوی داوداوکراوی وشکەوەکراو ف رشتهٔ آشی.

**هەرشتیٚ:** هەرشت ف هرچیزی.

**هەرْشتی:** ۱) رێزالْ بوُگ؛ ۲) پلْیخاو ف ۱) ازهم پاشیده؛ ۲) لەشده.
**هەرشەم:** گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.
**هەرشەو:** گش شەویْ ف هرشب.
**هەرْشین:** هەرْشتن، هەرْشاندن ف نگا: هەرْشاندن.
**هەرْفاندن:** تێكرْوخاندن، رْماندن ف خراب کردن، فروریزاندن.
**هەرْفتاندن:** تێك رْوخاندن ف فروریزاندن.
**هەرْفتن:** تێكرْوخان ف ریزش کردن دیوار و کوه.
**هەرْفتی:** تێكرْوخاو ف درهم ریخته، ریزش کرده.
**هەرْفتین:** هەرْفتن ف ریزش کردن دیوار و کوه.
**هەرْفی:** رما، روخا، داتەپی ف ریزش کرد.
**هەرْفین:** روخان، هەرْفتن ف نگا: هەرْفتن.
**هەرڤ:** جەنگ، شەرْ ف جنگ.
**هەرڤە:** چالاك، چابك ف چابُك.
**هەرق:** خەندەك، کەندەك، رەهەند ف خندق.
**هەرك:** ۱) تۆمی دانەوێڵە؛ ۲) ئەو دەغلەی کە بۆ تۆ و جیا دەکرێتەوە، دره ف ۱) تخم کاشتنی‌ها؛ ۲) مقدار غلّه‌ای که به بذر اختصاص می‌یابد.
**هەرْك:** ۱) بزاو، بزوتن: (ڤێ بهەرْکینە)؛ ۲) وتەی سەیرمان، حەك؛ ۳) قورْ، حەرْی ف ۱) حرکت؛ ۲) حرف تعجّب؛ ۳) گِل.
**هەرکات:** هەردەم، چساتێ ف هرگاه، هردم.
**هەرکاتێ:** هەردەمێ ف هر وقتی.
**هەرکام:** هەریەك ف هر یك، هرکدام.
**هەرکان:** ۱) نەزۆك، گیانداریْ کە منالْو بێچوی نابێ؛ ۲) هەرتکان ف ۱) نازا، عقیم؛ ۲) هردوی آنها.
**هەرکاندن:** نەزۆك کردن ف عقیم کردن.
**هەرْکـانـدن:** ۱) بزوانـدن، بزاوتن؛ ۲) وەرێ‌خستن: (ئـاف هەرْکاند، لەشکر **هەرْکاند**) ف ۱) حرکت دادن، جنبانیدن؛ ۲) راه انداختن.
**هەرکۆ:** هەرجێ ف هرکجا.
**هەرکـوُ:** ۱) هەرچـوْن؛ ۲) دەست‌بەجێ: (هـەرکوُ دیتم لێم‌دا) ف ۱) هرطور؛ ۲) همینکه.
**هەرکوُدە:** ۱) بۆ هەرکوێ؛ ۲) لە هەرکوێ ف ۱) بەهرکجا؛ ۲) در هر کجا.
**هەرکۆر:** کەسێ زەوی دەکۆڵێ ف زمین کن.
**هەرکۆگە:** هەرکۆ ف هرکجا.
**هەرکولۆج:** هەرچۆن، بە هەرئاوایەك ف هرطور.
**هەرکـونـدی:** لەو گونـدانـەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.
**هەرکوێ:** هەرکۆ ف هرکجا.
**هەرکوێنە:** هەرکوێ، هەرکۆ ف هرکجا.
**هەرکە:** ۱) چتۆ بنیادەم؛ ۲) بێ‌درەنگ؛ ۳) لێی‌پێچە، بیکە گلۆڵە ف ۱) هرکس؛ ۲) همینکه؛ ۳) بپیچ، گلوله کن.
**هەرکەبو:** هەر بنیادەمێ بو بێت ف هرکه بود.
**هەرکـەبۆخۆی:** ۱) رفان‌رفان؛ ۲) دنیای بێ‌قانوُنی زۆردارو بێ‌زۆر ف ۱) مسابقه درربودن؛ ۲) دنیای هرکس هرکس، قانون جنگل.
**هەرکەس:** هەر بنیادەمێ ف هرکس.
**هەرکەس‌هەرکەس:** هەرکە بۆخۆی ف هرکی هرکی.
**هەرکەهەرکە:** هەرکە بۆخۆی ف هرکی هرکی.
**هەرکی:** ۱) عاشیرەتێکـە لە کوردستـان؛ ۲) هەرکـەس ف ۱) نام عشیره‌ای در کردستان؛ ۲)هرکس.
**هەرکێ:** هەرکەس ف هرکس.
**هەرْکی:** ۱) بزوُت؛ ۲) رۆیشت ف ۱) جنبید؛ ۲) رفت.
**هەرکی‌بیداو:** لەو گونـدانـەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی درکردستان که بعثیان آن را ویران کردند.
**هەرکیتە:** گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.
**هەرکیژان:** هەرکامیان. *تایبەتی مرۆیە* ف هرکدامشان. ویژهٔ *انسان*.
**هەرکیژك:** هەرکامیان. *تایبەتی جگە لە مرۆیە* ف هرکدامشان. ویژهٔ *غیرانسان*.
**هەرْکێل:** کەسێ کە تۆی بە زەمینی تەرەوە کردوەو جوُتی‌دەکا ف کسی که بر زمین مرطوب بذر پاشیده و شخم زند.
**هەرکین:** ۱) نەزۆك‌بوُن؛ ۲) بزوتن، جوُلان ف ۱) نازاشدن؛ ۲) جُنبیدن.
**هەرْکین:** ۱) بزوُتن؛ ۲) وەرێ‌کەوتن ف ۱) حرکت کردن؛ ۲) بەراه افتادن.
**هەرکینە:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.
**هەرگْ:** هەریەك، هەرکام ف هر یك.
**هەرْگ:** ۱) قورْ، حەرْی، هەرْ؛ ۲) هەرْك ف ۱) گِل؛ ۲) نگا: هەرْك.
**هەرگا:** هەرکات ف هرگاه.
**هەرگاڤ:** هەرگا ف هرگاه.
**هەرگاو:** هەرگا ف هرگاه.
**هەرْگاو:** قورْاو ف لجن.
**هەرگل:** هەرجار ف هردفعه.
**هەرگوُ:** هەرگْ، هەریەك ف هر یك.
**هەرگـوُجای‌رْۆشیایش:** هەرکەسە بەلایەکدا بڵاوەکردن ف هرکس به سویی متفرّق شدن.
**هەرگوُچی:** هەرشتێك ف هرچیزی.
**هەرگوُیەو:** هەریەکەی ف هریکی.
**هەرگیز:** قەت، بەهیچ کلۆجێ ف هرگز.
**هەرگیس:** هەرگیز ف هرگز.
**هەرْگین:** دروسکراو لە قورْ ف گِلین.
**هەرْگینە:** سواڵەت. لە حەرْی چێ‌کری ف سفال.
**هەرلا:** ۱) گش ئالیەك؛ ۲) هەمیشە لاسار ف ۱) هرطرف؛ ۲) همواره لجباز.
**هەرلە:** داپیرۆشك، پیرێژنۆکە، پیرایشۆکە ف خر خاکی.

**هەرمـان:** ۱) هەرگیز نەفـەوتـان؛ ۲) کار، شوُل، خەبات، فرمان ف ۱) جاودانگی؛ ۲) کار.

**هەڕمان:** رمان، رمیان، روُخان، هەڕفتن ف فروریختن دیوار وکوه.

**هەڕماندن:** ۱) بێبەش کردن لە ماف؛ ۲) پیس کردن: (چێڵەکا فیژۆکەر گاڕانەکی **دەهەڕمینە**)؛ ۳) بەخەساردان: (تەبەرەی خۆ **هەڕماند**) ف ۱) محروم کردن؛ ۲) آلوده کردن، کثیف کردن؛ ۳) ضایع کردن، بەهدردادن.

**هەڕمتی:** روُخاو، رمیاو، هەڕفتی ف فروریخته.

**هەرمْك:** نێرەموك ف نەنر نە مادە.

**هەرمگ:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان کە بعثیان آن را ویران کردند.

**هەرمن:** گونـدێکـە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**هەرموُسك:** مشکەکوڕە، جرجەمشك ف موش کور.

**هەرمـوُش:** هێشـوەترێی بەدارەو وشکەوەبوُگ ف خوشە انگور خشك شدهٔ آویزان از درخت.

**هەرموُشك:** هەرموُسك ف موش کور.

**هەرمە:** شان، پیل، مل ف کتف.

**هەرمەت:** توُکێکە واتا: بتۆپێ، کوێربی، هەرمەند ف دعای شرّ، نوعی نفرین.

**هەرمەل:** ئەسپەندەر ف اسپند.

**هەرمەلە:** هەراو چەقەچەق، گیڕەو نیڕە ف سروصدای جنجال.

**هەرمەڵە:** ۱) بنەگوڵێکی بڵندە ڕەنگی گەڵای ئامال خوڵەکەوەیە گوڵی بە زۆررەنگان دەگرێ؛ ۲) لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف ۱) گل ختمی؛ ۲) روستایی درکردستان کە بعثیان آن را ویران کردند.

**هەرمەن:** وڵاتی هەرمەنی، زێدی هەرمنی ف ارمنستان.

**هەرمەند:** هەرمەت ف نگا: هەرمەت.

**هەرمەنی:** گەلێکی کەونارایە لە ڕۆژگاری کەونارادا دەوڵەت بوەو جیرانی کوردان بوُن ف قوم ارمنی.

**هەرمی:** هرمی، هارمێ ف گلابی.

**هەرمێ:** هەرمی ف گلابی.

**هەڕمی:** روُخاو، رماو، هەڕفتی ف فروریخته.

**هەرمێ پشکوان:** خاکەلێوە ف فروردین‌ماه.

**هەرمێشك:** نانی دەناورۆن گوشراو ف چنگالی نان در روغن ترید شده.

**هەرمێ کڕوُزی:** جۆرێ هەرمێ کە لە ترشیاتی دەکەن ف نوعی گلابی.

**هەرمێ کێویلە:** کرۆسك ف گلابی جنگلی.

**هەرمێ گوڵاوی:** جۆرێ هەرمێ ف نوعی گلابی.

**هەرمێ لاسوُرە:** جۆرێ هەرمێ ف نوعی گلابی.

**هەرمێلە:** ناوی دو گوندە لە کوردستان کە یەکیان بەعسی وێرانی کرد ف نام دو روستا کە یکی از آنها توسط رژیم بعث عراق ویران گردید.

**هەرمێ مام‌سارمە:** جۆرێ هەرمێ ف نوعی گلابی.

**هەڕمـین:** ۱) مان گرتن، گەگرتن، جەنـەگرتن؛ ۲) بەفیرۆچـوُن؛ ۳) روُخان، رمان ف ۱) اعتصاب کردن؛ ۲) بەهدررفتن؛ ۳) فروریختن.

**هەڕمێن:** رمێن، برەو ف رواج.

**هەرْن:** ناوی گوندێك و چیایەکە لە کوردستان ف نام روستایی و کوهی در کردستان.

**هەڕن:** ۱) ژێدەری ڕۆیشتنە؛ ۲) خوڵاوی؛ ۳) بڕۆن، بچن ف ۱) مصدر رفتن؛ ۲) خاك‌آلود؛ ۳) بروید.

**هەرنێ:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان کە بعثیان آن را ویران کردند.

**هەرند:** ۱) هەرد؛ ۲) شوێن گێڕ ف ۱) زمین؛ ۲) ردیاب.

**هەرندی کەردش:** شوێن‌دۆزینەوە ف ردیابی کردن.

**هەڕنی:** مانی گرت ف اعتصاب کرد.

**هەڕنێ:** بۆی‌بچن، بۆی‌بڕۆن ف بروید بە.

**هەڕنـین:** ۱) هەڕمین، مان گرتن؛ ۲) مانیان گرت لە ڕۆیشتن، غەزرین، پێیان چەقاند ف ۱) اعتصاب کردن؛ ۲) اعتصاب کردند.

**هەرۆ:** ۱) باڵدارێکی ڕەشی زۆر بەتەوژمی ڕاوکەرە؛ ۲) کەرۆ، کاورای کەر ف ۱) عقاب؛ ۲) خره، ای الاغ.

**هەروُ:** ۱) هۆگر؛ ۲) بچۆ، بڕۆ ف ۱) انس گرفته، خو گرفته؛ ۲) برو.

**هەڕو:** بچۆ، بمەش، بچە، بڕۆ ف برو.

**هەڕۆ:** ۱) هەڕو؛ ۲) هەرڕۆژ، هەرڕۆ ف ۱) برو؛ ۲) هرروز.

**هەروا:** ۱) چێشتی ئاردو ڕۆن و دۆشـاو، حەلـوا؛ ۲) بەخـۆڕایی؛ ۳) ئابەم‌جۆرە ف ۱) حلوا؛ ۲) رایگان؛ ۳) همین طور.

**هەروبار:** ۱) کەرو بار؛ ۲) برێتی لە دارمێوی لە داری تر هاڵاو ف ۱) خروبار؛ ۲) کنایە از تاك پیچیدە بر درخت دیگر.

**هەڕوپف:** ۱) دەنگی پشیلە لە بەیەکاچوُنا؛ ۲) برێتی لە توُڕەبوُنێ کە زوُ خەلاس دەبێ: (گوێ مەدەیە توُڕەیی ئەو **هەڕوپفێکە** دەبڕێتەوە) ف ۱) نعرهٔ گربە هنگام جنگ؛ ۲) کنایە از خشم زودگذر.

**هەروتـە:** گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**هەروتـە کـۆنە:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان کە بعثیان آن را ویران کردند.

**هەروتیان:** گەلی و دۆڵێکە زۆر گوندی تێدان بەعسی هەموی وێران کرد ف درّه‌ای با روستاهای بسیار کە توسّط رژیم بعث عراق ویران شدند.

**هەرۆز:** هەرڕۆژ ف هر روز.

**هەرۆسا:** هەر ئاوا، هەر بەم‌جۆرە ف همچنین، همین طور.

**هەروش:** کڕە، لە دەستاڕکراو ف کوبیدە با دستاس.

**هەروُشك:** هەرمێشك ف چنگالی خوراکی، نگا: هەرمێشك.

**هەڕوگیف:** گەف، گوڕەشە ف تهدید.

**هەروُم:** چەموُش، بۆ ئێستر و بارگینی توڕو بەدفەڕ ئێژن ف چموش.

**هەرون:** ۱) شوێن‌پا؛ ۲) جێگە ف ۱) ردپا؛ ۲) جای.

**هەروند:** هەرون ف نگا: هەرون.

**هەرونە:** هەرون، هەروند ف نگا: هەرون.

**هەڕووەل:** تۆزو خوڵ [ف] گردوخاك.

**هەروە:** هەروا، ئا بەمجۆرە [ف] همین طور.

**هەرۆها:** هەروا، هەروە [ف] همین طور.

**هەروەتر:** پتر لەوە کە بیردەبەی [ف] بس بیشتر.

**هەروەك:** تەواو لەگوێن، لەوێنە، لەچەشنی [ف] همانند.

**هەروەکو:** هەروەك [ف] همانند.

**هەروەکی:** هەروەك [ف] همانند.

**هەروەكیەك:** بەرانبەر، بێ زیادو کەمێ لە نێوان‌دا [ف] کاملاً مانند یکدیگر، برابر.

**هەروەها:** هەروا، هەرۆها [ف] همینطور.

**هەروهەر:** دایمو دەرهەم، بێ‌بڕانەوە [ف] همیشه.

**هەڕو هەراو:** زۆر پان‌و بەرین [ف] بسیار فراخ و وسیع.

**هەروێ:** خەروێ، کەروێشك، کێرۆشك [ف] خرگوش.

**هەروێشك:** هەرمێشك [ف] چنگالی، نگا: هەرمێشك.

**هەرە:** ۱) وتـەیەکـە بۆ تەوپـەڕ نیشـانـدان، ترین: (هـەڵگورت لە چیا هەرەبەرزەکانی کوردستانە)؛ ۲) ریزەئاڵوداریێ کە بەسەر پردڵەی ژێر بەرداشـدا ڕایەڵ کراون؛ ۳) ریزەخـشـتی لەسـەر لا دانـدراو بۆ ئیشك‌بوونەوە؛ ۴) هەڕ، قوڕ؛ ۵) ماکەر [ف] ۱) نشانهٔ صفت عالی، ترین؛ ۲) ردیفـی تیر چوبـی در سقف زیر سنـگ آسیا؛ ۳) ردیف خشتِ بر پهلو چیده‌شده برای خشك شدن؛ ۴) گِل؛ ۵) ماچه‌الاغ.

**هەڕە:** ۱) هەڕو، هەڕۆ، بڕۆ، بچۆ، بچە، بمەش؛ ۲) مشار، تیخی ددانەدار بۆ داربڕینەوە؛ ۳) تیغە، دیواری ناسکی نێوان‌دودیو؛ ۴) زەڕەی کەر؛ ۵) قوڕ، حەڕی؛ ۶) ون‌بە، گوم‌بە لەبەر چاو [ف] ۱) برو؛ ۲) ارّە؛ ۳) تیغە، دیوار نازك؛ ۴) عرعر الاغ؛ ۵) گِل؛ ۶) گم‌شو.

**هەرەئـاسێ:** شاخی لە شاخـان سەخت‌تر [ف] کوهِ صعب‌العبـورتر از کوههای دیگر.

**هەرهال:** هەرچۆن بێت [ف] بەهرحال.

**هەرەباش:** چاکتر لە گش [ف] بهترازهمه، بهترین.

**هەرەبـەرز:** لە گش بڵنـدتـر. *دەورانی کەونـارادا ناوی کێوی ئەلبورز هەرەبەرز بوە* [ف] بلندترین.

**هەڕەپـۆپـە:** کەڵـەشێرێ کە پۆپەی قیت‌و ددانەدار بێ، پۆپەمشار [ف] خروس تاج ارّه‌ای.

**هەڕەت:** ۱) دەرفەت، کێس؛ ۲) جەنگە، کاتی زۆربوونی شتێ: (**هەڕەتی** جوانیم بو، هاوین **هەڕەتی** میوەیە) [ف] ۱) فرصت؛ ۲) عنفوان، موسم.

**هەرەز:** ناوچەیەکە لە کوردستان [ف] ناحیه‌ای در کردستان.

**هەرەزاڵ:** لە گش دەسەڵات‌دارتر [ف] مقتدرترین.

**هەڕەزاڵە:** گیایەکە، ریزەڵە [ف] گیاهی است، نگا: ریزەڵە.

**هەرزەل:** ۱) زەلام‌تر لە زەلامان؛ ۲) گەورەی گەوران [ف] ۱) گنده‌تر از همە؛ ۲) بلندپایه‌ترین.

**هەرەزوو:** ۱) زووتـر لە گش؛ ۲) لەمێژینـەتـر لە ڕۆژگاری ڕابـردو [ف] ۱) زودترین؛ ۲) ماقبل تاریخ.

**هەرەزۆر:** زۆرتر لە زۆر [ف] بیشترین.

**هەرەزوی:** هەرەزوو [ف] زودترین.

**هەرەزینگ:** ئامرازی داغ‌کردن لە ئاسن، مۆری داغ‌کردن [ف] مُهر داغ‌گذاری.

**هەرەژنە:** ئانیشك [ف] آرنج.

**هەرەس:** ۱) پسـان‌و داڕووخانی پارچەبەردوخاك لە چیا: (کێو هەرەسی هێنـا)؛ ۲) رنۆ، رنی، کڵێڵە، شاپە، کەوی، کەویەبەفر: (قەڵاتی زێوی ڕووخاوە **هەرەس** بە تۆپی نەسیم/ سوپاهی لالەو گوڵ چادری لە جێ هەڵـدا) «حاجی قادر»؛ ۳) ڕۆندك، فرمێسك [ف] ۱) گسستن و ریزش قطعه‌ای از کوه؛ ۲) بهمن؛ ۳) اشك.

**هەرەس‌بردن:** پسانی کێو یان ڕنۆ [ف] گسستن و ریزش کردن کوه یا بهمن.

**هەرەس‌هێنان:** هەرەس‌بردن [ف] نگا: هەرەس‌بردن.

**هەڕەشە:** گەف. گوڕەشە. هەڕوگیف [ف] تهدید.

**هەڕەشەوگوڕەشە:** هەڕوگیف [ف] تهدید.

**هەرەك:** ۱) هەریەك لەوان؛ ۲) بزاو؛ ۳) کەری چکـۆڵـە؛ ۴) کاری بەڕاستی، بێ‌گەمە؛ ۵) ئەستێرە هەرە گەشەکەی نزیك بە هیف [ف] ۱) هریك از آنهـا؛ ۲) حرکت؛ ۳) خر کوچـك؛ ۴) کار جدّی؛ ۵) نام ستاره‌ای درخشان.

**هەرەکـان‌و مەرەکـان:** قامێکی منـاڵانەیە لە جۆرێ گاڵتەدا دەیڵێن. *ڕەنگە بەواتا: بزوتنەوەو پشودان‌و هەدادان بێ* [ف] ترانه‌ای کودکانه.

**هەرەکـردن:** ریزکردنی خشتان لەسەر لا بۆ وشك‌بوونەوە [ف] ردیف کردن خشتها بر پهلو به منظور خشك شدن.

**هەڕەکردن:** بە مشار بڕینەوە [ف] ارّه کردن.

**هەرەکە:** کەرەکە، خەرەکە [ف] آن الاغ.

**هەڕەکـە:** ۱) بزاو، بزووتن؛ ۲) مشـارەکە، ئامرازی داربڕینەوەکە [ف] ۱) حرکت؛ ۲) آن ارّه.

**هەرەکەت:** هەڕەکە، تەقگەر، بزاو، جوڵانەوە [ف] حرکت.

**هەڕەکەت:** هەرەکەت [ف] حرکت.

**هەرهلی:** میوەی بڵ‌و زۆر گەیشتو [ف] میوهٔ زیاد رسیدهٔ نرم شده.

**هەڕەم:** ۱) ژووری ئەندەرون؛ ۲) برێتی لە ژنی مێرد [ف] ۱) حرم، اندرون خانواده؛ ۲) کنایه از همسر، عیال.

**هەڕەماسی:** جۆرێ ماسی‌یە ئێسکێکی وەك مشاری لە دەم هاتۆتەدەر [ف] ارّه‌ماهی.

**هەڕەمە:** ۱) جەنگە، هەڕەت؛ ۲) برەو، پەرە؛ ۳) پڕایی خەڵك‌و کۆمەڵ؛ ۴) گەنم‌و دانـەوێڵەی تێکـەڵاوکـراو؛ ۵) لەز، پەلـە؛ ۶) گۆترە [ف] ۱) موسم، عنفوان؛ ۲) رواج؛ ۳) انبوهی مردم؛ ۴) حبوبات مخلوط؛ ۵) عجله و شتاب؛ ۶) درهم، بدون محاسبه.

**هەرهۆ:** هەر ئاوها [ف] همین طور.

**هەرەوەڕ:** زۆربلێ، چەنەباز [ف] وراّج.

**هەرەوەز:** زبارە: (هەرەوەزە نان‌و بەزە)، مەهبەرە [ف] کار تعاونی.

**هەرهە:** لە فەوتان بێ‌بەش [ف] جاوید.

**هەرهەس:** قەت نافەوتێ [ف] همیشه هست.

**هەڕەهەڕ:** گوڕەگوڕ، چەقەچەقی شەڕاوی ف جاروجنجال خشم‌آلود.
**هەرهەیە:** هەرهەس ف همیشه هست.
**هەرەی:** ١) فیز، دەعیە؛ ٢) درەنگ، دێر وەخت ف ١) تکبّر؛ ٢) دیر وقت.
**هەرەی کوتەنە:** وەدرەنگی کەوتن ف دیرشدن، به دیر وقت افتادن.
**هەری:** ١) خوری، هری؛ ٢) کوڕو؛ ٣) هەرە، ترینی پێشگر: (**هەری** مەزن واتا: زلترین) ف ١) پشم؛ ٢) کُرك، پشم زیرین؛ ٣) ترین.
**هەرێ:** ١) ئارێ، بەڵێ؛ ٢) ئاخـوێ، ئەرێ؟؛ ٣) ئێوارەوەخت؛ ٤) بانگ کردن لەژن؛ ٥) برێتی لە کاورای بێ ئاگا؛ ٦) برێتی لە وانیە، کەی وایە؟ ف ١) آری؛ ٢) آیا؛ ٣) عصرهنگام؛ ٤) ندا برای مؤنّث؛ ٥) کنایه از آدم بی‌خبر؛ ٦) کنایه از نفی، چنین نیست.
**هەڕی:** حەڕی، قوڕ، هەڕ ف گِل.
**هەریاس:** دو گوندی کوردستان بەم‌ناوە بەعسی وێرانی کردن ف نام دو روستای کردستان که بعثیان ویران کردند.
**هەڕی بسەر:** قوڕبەسەر، خاکەسەر، برێتی لە بێچارە ف کنایه از بیچاره.
**هەریر:** ١) جۆرێك هەڵـوا کە لە دۆشاوی وشکەوەکراو سازدەکرێ؛ ٢) ناوچــەیەك‌و شاروکێکــە لە کوردستــان بەعسی وێرانی کردن؛ ٣) پارچەی ئاورێشمی، حەریر ف ١) نوعی حلوا که از شیرهٔ خشکیدهٔ انگور سازند؛ ٢) نام منطقه‌ای و شهرکی درکردستان که بعثیان آن را ویران کردند؛ ٣) پارچهٔ ابریشمی، حریر.
**هەرێز:** فریزو ف فریز.
**هەریسە:** کەشکەك، چێشتی گەنمەکوتاو بەگۆشتەوە ف آش حلیم.
**هەرێ‌شامی:** جسنێکی سپی‌ڕەنگ لە گوێرێژ ف نوعی الاغ سفیدرنگ.
**هەڕیکار:** کەسێ کە کاری قوڕ دەکا ف گِلکار.
**هەڕیکاری:** قوڕەکاری ف گِلکاری.
**هەڕیکەر:** کەسێ قوڕ دەگرێتەوەو دەیشێلێ ف گِل سرشت.
**هەڕی کێڵ:** هەڕکێڵ ف نگا: هەڕکێڵ.
**هەرێم:** ١) دەوروبەری ئاوایی کە ناکێڵدرێ‌و ماڵی هەموانە؛ ٢) ناوچە، مەڵبەند ف ١) حریم عمومی آبادی؛ ٢) منطقه، ناحیه.
**هەرێ‌مسری:** جۆرێ گوێرێژی ئاماڵ‌سپی ف نوعی الاغ سپیدفام.
**هەری مەندش:** زۆرپیر، زورهان، فریە وەتەمەن ف بسیار پیر و فرتوت.
**هەڕێن:** خوڵاوی ف خاك‌آلود.
**هەری نایش:** کڕین، سانن ف خریدن.
**هەریەك:** ١) هەرەك، هەرکام؛ ٢) تەنیا یەکێ ف ١) هریك؛ ٢) فقط یکی.
**هەریەکــە:** ١) هەریەك لەوان، هەرکــامێك؛ ٢) تەنیا یەکێکــە ف ١) هریکی؛ ٢) فقط یکی است.
**هەرێ‌هەرۆ:** وشەی گەف کردن لە پیاو ف کلمهٔ تهدید مرد.
**هەرێ‌هەرێ:** ١) بەڵێ بەڵێ، ئاخۆ وابو؟؛ ٢) هەڕەشە لە ژن واتا: دەزانم چت کردوە ف ١) آیا چنین بود؟؛ ٢) کلمهٔ تهدید زن.
**هەز:** ١) حەز، ئارەزو؛ ٢) ئەوین؛ ٣) ئیشتیا ف ١) آرزو؛ ٢) عشق؛ ٣) هوس.
**هەزار:** دەجار سەت، بیست‌چەل پەنجا، پەنجاجار بیست ف هزار.

**هەزارا:** چەندجار هەزار: (**بهەزارا** لەشکر درێکێدان) ف هزاران.
**هەزاران:** زۆرجار هەزار، هەزارا ف هزاران.
**هەزاران‌هەزار:** چەند میلیۆن، دەجار سەدهەزار سەدهەزار ف میلیونها.
**هەزاربەهزار:** شاخی زۆر بەرزو ئاسێ ف کوه سنگی بسیار بلند و دارای پرتگاه.
**هەزارپا:** زێلو ف هزارپا.
**هەزارپرتی:** کلاوقازی، شتێکی توێ‌لەسەرتوێ‌یە لە ناوزگی حەیواندا، هەزارلۆغانە ف هزارلای سیرابی.
**هەزارپۆپ:** کەڵەشێری پۆپەپان ف خروس تاج‌پهن.
**هەزارپۆپنە:** هەزارپۆپ ف خروس تاج‌پهن.
**هەزارپۆپە:** هەزارپۆپ ف خروس تاج پهن.
**هەزارپێ:** هەزارپا ف هزارپا.
**هەزارپیشە:** ١) خوانچەیەکی دارینە چاوەچاوە کراوە بۆ ئەوە زۆر شتی جیا جیای تێخـەن؛ ٢) برێتی لە کەسێ سەری لە زۆرکاران دەرچێ: (پێت وابـو هەژا **هەزارپیشە**/ مەی سوورە ڕژا لە زارەشیشە) «مەم‌و زین» ف ١) صندوقچهٔ طبقه‌بندی شده؛ ٢) کنایه از آدم همه‌فن حریف.
**هەزارتوێ:** ١) هەزارپرتی؛ ٢) برێتی لە بنیادەمی دەبنەوەبڕ و ناڕاست ف ١) هزارلای سیرابی؛ ٢) کنایه از آدم تودار و نادرست.
**هەزارتوێخ:** هەزارتوێ ف نگا: هەزارتوێ.
**هەزارڕەگ:** برێتی لە زوڵ‌و حەرامزادە، بیژ، پیچ ف کنایه از حرامزاده.
**هەزارگەز:** گیایەکە ف گیاه هزارگوشان.
**هەزارلۆ:** هەزارتوێ ف نگا: هەزارتوێ.
**هەزارلۆخانە:** هەزارپرتی ف هزارلای سیرابی.
**هەزارلۆغانە:** هەزارپرتی ف هزارلای سیرابی.
**هەزارلوێ:** هەزارپرتی ف هزارلای سیرابی.
**هەزارمێرد:** لەو گونــدانــەی کوردستـانـە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.
**هەزارویەك‌لایە:** هاتـوچۆی کەروێشك لەسەر بەفر بۆ شوێنەونکە ف رفت و برگشت خرگوش روی برف برای ردگم کردن.
**هەزارویەك‌لایی:** هەزارویەك‌لایە ف نگا: هەزارویەك‌لایە.
**هەزارە:** ١) هەزارویەك‌لایی کەروێشك؛ ٢) بەردی قیتی لێواری حەوز؛ ٣) لێواری تاقــەی ناو دیوار؛ ٤) خەوزڕان‌و خەیاڵات‌کردنــی ناو جێگــە؛ ٥) بیرەوەری هەزارســاڵــەی لەدایك‌بوُن یان مردنی پیاوی گەورە؛ ٦) ناوە بۆ ژنان ف ١) نگا: هەزارویەك‌لایە؛ ٢) سنگ برجستهٔ لبهٔ حوض؛ ٣) لبهٔ طاقچه؛ ٤) خواب از سر پریدن به فکر فرورفتن در رختخواب؛ ٥) یادبود هزارمین سال تولّد یا مرگ بزرگان؛ ٦) نام زنانه.
**هەزارەزیلە:** کۆمەڵێ زۆر لە مناڵەورتکە ف جمعیت زیادی از کودکان.
**هەزارەك:** لە هەزارپاژ پاژێك ف یك هزارم.
**هەزارە کــردن:** ١) خەیاڵات‌کردنی خەوزڕاو؛ ٢) شوێنـەونکـەکـردنی کەروێشك لەسەر بەفر ف ١) به فکر و خیال فرورفتن آدم بدخواب؛ ٢) ردگم کردن خرگوش روی برف.

**هەزاریەك:** هەزارەك ف یك هزارم.

**هەزاز:** ١) هەرەس‌هێنـانی چیاو کەنـداڵ؛ ٢) ڕوُخـانی کێو؛ ٣) جۆرێ نەخـۆشی وەك‌گولی ف ١) گسستگی کوه و گودال؛ ٢) فروریختن کوه، ریزش کوه؛ ٣) نوعی بیماری جذام مانند.

**هەزانـدن:** راوەشـانـدن، وە لەرەلـەرخـستن، هەژانـدن ف تکان دادن، بەلرزش انداختن.

**هەزاوا:** ئەزوا، تاڵی شاری ف آلوا، نگا: ئەزوا.

**هەزبۆ:** مەرزە کێفیلە ف مرزهٔ کوهی.

**هەزبێ:** گیادانو ف گیاهی است.

**هەزبیە:** ١) گیای بۆن‌خۆشی وشکەوەکراو بۆ ناو چێشت؛ ٢) ناعنە ف ١) گیاه خوشبوی خشك کرده برای خورش؛ ٢) مرزه.

**هەزبیە کێویلە:** نەعناکێویلە ف مرزهٔ کوهی.

**هەززۆ:** شارێکـە لە کوردستـانی بەردەستی ترکـان لە نێوان ساسۆن‌و کۆزلوك بنگەی فەرمانداری‌یە ف شهری در کردستان.

**هەزژێ کرن:** ١) دڵ‌پێدان؛ ٢) بەدڵ ئارەزوکـردنی ف ١) دل به دلـدار دادن؛ ٢) قلباً چیزی را آرزو کردن.

**هەزکرن:** دڵداری ف عاشق شدن.

**هەزکـــەر:** ١) ئەوینـــدار؛ ٢) ئارەزوکـەر ف ١) عاشق؛ ٢) آرزومنـد، خواستار، دوستدار.

**هەزم:** تاوانەوەی خواردن لە ورگدا، عەزم، هەڵتاوین ف هضم.

**هەزن:** خەم، ناهومێدی ف غم.

**هەزۆ:** ناوچـەیەکە لە کوردستانی بەردەستـی ترکان ف ناحیەای درکردستان.

**هەزوا:** هەزاوا، عەزوا، ئەزوا، تاڵی شاری ف الوا، صبر.

**هەزۆر:** ١) شارێك‌و ناوچەیەکە سەربە دیاربەکر لە کوردستان؛ ٢) ناوی تاخێکە لە شاری بتلیس لە کوردستان ف ١) نام منطقەای و شهری در کردستان؛ ٢) محلّەای در شهر بتلیس.

**هەزوە:** مەرزەی کێفی ف مرزهٔ کوهی.

**هەزوێلە:** وشکـەگیاو شتی بـۆن‌و تام‌خوشکـەری چێشت ف ادویە، بهارات.

**هەزەخ:** ١) ممبـارەك، پیرۆز؛ ٢) بەرێژەو، بەحاسڵ؛ ٢) ناوی گوندێك‌و ناوچـەیەکـە لە کوردستـان ف ١) مبارك؛ ٢) پُردرآمد؛ ٣) نام دهی و ناحیەای در کردستان.

**هەزهەز:** فڕەفڕی باڵی بێچوەکۆتر کاتێ لەناو هێلانەدایە ف صدای بال زدن جوجهٔ کبوتر در لانە.

**هەزهەزایش:** هەڵوەرین لەبەر ڕزیوی ف فروریختن از پوسیدگی.

**هەزەی:** وەکو، لەگوێن ف مانند، مثل.

**هەزیا:** زەها، حەزیا ف اژدها.

**هەزیر:** بەراورد، قرسان، خەمڵ ف تخمین.

**هەزیران:** ١) مانگێکی ساڵە؛ ٢) حەیزەران ف ١) یکی از ماههای سال میلادی؛ ٢) چوب خیزران.

**هەزیرانی:** جۆرێ هەرمێ ف نوعی گلابی.

**هەزیرکرن:** قرساندن، خەمڵ‌کردن، بەراوەردکردن ف تخمین زدن.

**هەزێلك:** هەرزاڵ، پێڕك، ئەستێڕك ف نگا: هەرزاڵ.

**هەزین:** هژان، بەرزو نەوی‌بوُنی سنگ لە نەفەس‌تەنگی ف نگا: هژان.

**هەزینگ:** راپەڕ، شنگڵ: (هەزینگ داخۆ) ف نگا: شنگڵ.

**هەژ:** ١) حەن، هەز؛ ٢) وشـــك؛ ٣) لکـەداری‌وشـك: (هــەژگەڵ)؛ ٤) دەشتی‌وشکارۆ ف ١) نگا: هەز؛ ٢) خشك؛ ٣) شاخهٔ خشك درخت؛ ٤) صحرای خشك.

**هەژا:** راتڵەکـا، لەرزی بەولاولادا: (مەشکەهەژا) ف لرزید، به اطراف نوسان کرد.

**هەژار:** ١) ژار، بێچـارە؛ ٢) نەدار؛ ٣) نازنـاوی شاعیرێکی هاوچەرخی کوردە ف ١) زار، بیچارە؛ ٢) فقیر؛ ٣) لقب یکی از شعرای معاصر کرد.

**هەژارخانە:** فەقیرخانە، ماڵێ کە بێ‌نانی لێ بەخێودەکەن ف نوانخانە.

**هەژارکەوتن:** ١) بێچارەبوُن؛ ٢) نەداربوُن ف ١) بیچارە و بینواشدن؛ ٢) فقیرشدن.

**هەژارەتی:** کۆششی فەقیرانە ف کسب بینوایانە.

**هەژاری:** ١) نەداری، ژاری؛ ٢) تەقالای فەقیرانە ف ١) بیچارگی؛ ٢) کسابت بینوایانە.

**هەژاڵ:** لکەدار بەگەڵاو پڕژەوە ف شاخە با برگ و جوانە.

**هەژالە:** گیای بێ‌کەڵك کە دەبێ بژار بکرێ ف گیاه هرزه کە باید وجین شود.

**هەژان:** ١) راتەکان؛ ٢) شەکانەوە ف ١) جنبش به هرطرف؛ ٢) اهتزاز.

**هەژانـدن:** ١) راژانـدن؛ ٢) ژانـدنی مەشکـە؛ ٣) راوەشـاندن ف ١) جنباندن؛ ٢) بهم زدن مشك؛ ٣) شدید تکان دادن.

**هەژدە:** دوان کەم لە بیست، پازدەو سێ ف هیجدە.

**هەژدەر:** قسەی بەپەلە: (**هەژدەر هەژدەر** قسەی لەدەم دەردەچێ) ف عجلە در گفتن، گفتار شتاب‌آمیز.

**هەژدەمین:** ئەو شتەی ژمارەهەژدەی بەردە کەوێ ف هیجدهم.

**هەژدەهەم:** هەژدەمین ف هیجدهم.

**هەژدەهەمین:** هەژدەمین ف هیجدهم.

**هەژڤاندن:** ترساندن ف ترساندن.

**هەژڤین:** ترسان ف ترسیدن.

**هەژقـانـدن:** وە دڵەتەپێ خستن، شێواندنی کەسێ ف مضطرب کردن، بەاضطراب انداختن.

**هەژقین:** شێویان‌و کەتنە دڵەخورپێ ف اضطراب.

**هەژکاندن:** هەژاندن ف نگا: هەژاندن.

**هەژك‌وبژاڵ:** پوش‌وپاڵ ف آت و اشغال.

**هەژك‌وبەژك:** چرپی‌وچاڵ ف شاخەهای خشکیدهٔ درختان.

**هەژك‌وپەژك:** چرپی وچاڵ ف شاخەهای خشکیدهٔ درختان.

**هەژگ:** ١) بەلـــەك؛ ٢) باسـك‌و زەنـد؛ ٣) ڕەشکـەی کاکێشـان؛ ٤) لکەداری وشك؛ ٥) ئالاش؛ ٦) تێخوڵی سەوزەو میوە ف ١) ساق؛ ٢) زند؛ ٣) تورکاهکشی؛ ٤) شاخهٔ خشك درخت؛ ٥) انبیره؛ ٦) پوست

میوە.

**هەژگوبژال:** چڕو چیلکەی ئاوردو ف چوب خشك هیمە.

**هەژگەڵ:** ١) لکەداری وشکەوەبوگ؛ ٢) چڕو چیلکەی ئاوردو ف ١) شاخهٔ خشك شدە؛ ٢) چوب هیمە.

**هەژگی:** پرزەی دار یان گیا ف پوشال چوب یا گیاه.

**هەژمار:** ١) ژمارە؛ ٢) ژمار ف ١) شمارە؛ ٢) شمار.

**هەژمارتن:** ژماردن ف شمردن.

**هەژماردن:** هەژمارتن، ژماردن ف شمردن.

**هەژمارده:** ١) بژێراو؛ ٢) نەقێنراو ف ١) شمرده؛ ٢) برگزیده.

**هەژماردی:** ژمێراو، هەژمارده ف شمرده.

**هەژمارە:** ژمارە ف شمارە.

**هەژمراندن:** ١) ژمارەکردن؛ ٢) ژمارتن، حەساوکردن ف ١) شمردن؛ ٢) حساب کردن.

**هەژمەت:** مەینەت، خەمو خەفەت ف غم و اندوه.

**هەژهار:** زێدەددان ف دندان اضافی.

**هەژهان:** لەرزین ف لرزیدن.

**هەژەت:** هەجەت ف نگا: هەجەت.

**هەژەك:** شەکان، لەرزە ف اهتزاز.

**هەژەند:** سەرسوڕێن ف عجیب و غریب.

**هەژهەژاڵ:** چیلکەوچاڵ ف هیمە، شاخ و برگ خشك.

**هەژهەژۆك:** زۆر بەلەرزە ف بسیار لرزان.

**هەژهەژۆکی:** لەرزینەوەی دایمی ف لرزش همیشگی.

**هەژهەژیك:** هاجهاجك ف چلچله.

**هەژی:** ١) بەرکـەتی، شایسـە، پەسند لەبەر دڵو چاو؛ ٢) بەنـرخ، قیمەتدار ف ١) شایسته، شایان؛ ٢) ارزشمند.

**هەژیاتی:** لێهاتوُیی، ژێهاتوُیی ف شایستگی.

**هەژیار:** هەژهار ف دندان زیادی.

**هەژیان:** ١) هەژان، هەژهان؛ ٢) ڕەوای نرخەکەی ف ١) جنبش جانبی؛ ٢) ارزیدن، شایان ارزش.

**هەژیای:** ڕاژاو، شەکاوە ف دراهتزاز.

**هەژیر:** هژیر، هەنجیر. میوەیەکـە چەنـد جۆری هەیە بەم*ناوانە*، درهی، هەرکەڤانی، هێکناتی، رژیك، شنگالی، تەفارە، زەرك ف انجیر.

**هەژیرە:** هەنجیرەکێویلکە ف انجیرکوهی.

**هەژی کرن:** حەزلێ کردن، ئەڤاندن، هەزژێ کرن ف عاشق بودن، دلدادهٔ کسی بودن.

**هەژین:** ١) ڕاژان، هەژان؛ ٢) بەرانبەری دەگەڵ قیمەت؛ ٣) بزوُتن ف ١) تکان خوردن، نوسان؛ ٢) ارزش؛ ٣) حرکت.

**هەژێن:** ڕاتڵەکێن، شەکێنەوە ف جنباننده.

**هەس:** ١) خاونبوُنـە، پێچـەوانەی نیە؛ ٢) حەس، ئاگا: (**هەس** دەکەم سەرمـامـە)؛ ٣) خەست، دژی تراو؛ ٤) وتـەی گا لەسـەر خەت گەڕانـدنەوە، هەرتە، هەرت؛ ٥) وزە، توانا؛ ٦) دارایی: (هەسو نیسم دا)؛ ٧) حەسحـەس، چەرخـەچی ف ١) هست؛ ٢) احسـاس؛ ٣) غلیظ؛ ٤) کلمـهٔ برگردانـدن گاو در شخم؛ ٥) نیرو؛ ٦) دارایی؛ ٧) نگهبان شب.

**هەسـار:** ١) گۆل، ئەستێر، ئەستێرك، ئەستێڵ؛ ٢) حەوش، حەوشـە، حەسار؛ ٤) قەلا ف ١) استخر؛ ٢) حیاط؛ ٣) قلعه.

**هەسارگەلە:** پەچە، حەوشەمەڕ ف شبغازه.

**هەسارە:** ١) حەوشەمەڕ، پەچە؛ ٢) ئەستێرە، ستارە، ستێری عاسمان ف ١) شبغازه؛ ٢) ستاره.

**هەسارەجوچکەدار:** ئەستێرەی کلکەدار ستارهٔ دنبالەدار.

**هەسارەزەڕینە:** کۆلکەزێڕینە، پەڵکەڕەنگینە، کەسكوسۆر ف رنگین کمان.

**هەسارەشناس:** نجوم گەر ف ستارەشناس.

**هەسارەگەڕێن:** هەسارەشناس ف ستارەشناس.

**هەسارەناس:** هەسارەشناس ف ستارەشناس.

**هەساری:** ١) ئەستێـڵ، گۆلاو؛ ٢) قەلانشیـن ف ١) استخر؛ ٢) قلعەنشین.

**هەساس:** نۆبەداری ئاوایی و بازاڕ بەشەو ف نگهبان شب، عسس.

**هەسان:** ١) سان، بەردەسان؛ ٢) سانەوە، ئیسراحەت؛ ٣) هەرچی خاوەن بوُنن؛ ٤) هاسان ف ١) فسان؛ ٢) آسودن؛ ٣) موجودات؛ ٤) آسان.

**هەساندان:** تیژکردنو ساوین بە هەساندا ف تیزکردن تیغ بافسان.

**هەساندن:** هەست کردن ف حسّ کردن.

**هەساندی:** تیژکراو بە هەسان ف تیزشده با فسان.

**هەسان کرن:** هەساندان: (من داساخۆە **هەسان کر**) ف تیزکردن با فسان.

**هەسانەڤە:** سانەوە ف آسودن.

**هەسانەوە:** سانەوە ف آسودن.

**هەساو:** ١) ساو، عاسمانی بێ‌هەور؛ ٢) ماڵین، پیاماڵین؛ ٣) تیژکراو بە سان؛ ٤) حەسـاب، حەسێب ف ١) آسمـان صاف؛ ٢) مالش؛ ٣) تیزشده با فسان؛ ٤) حساب.

**هەساوین:** پیاماڵین، ساوین ف مالیدن، ساییدن.

**هەسبـانـدن:** گومـانبردن، وا تێگەیشتن: (ئەو من زارۆ د**هەسبێنە**) ف ارززیابی کردن.

**هەسپ:** ئەسپ ف اسب.

**هەسپا:** ئەسپا، لەسەرخۆ، سەبر ف آهسته.

**هەسپاو:** ئەسپاب، ئامراز، ئامێر ف ابزار، اسباب.

**هەسپایی:** ئەسپایی، بە لەسەرخۆیی ف آهستگی.

**هەسپزە:** گیایەکە لە وێنجە دەکا ف گیاهی است شبیه یونجه.

**هەسپست:** ١) گونـدێکـە لە وڵاتی بوتـانی کوردستـان کە ژێردەستی ترکانە؛ ٢) وێنجـەکێویلە ف ١) روستـایی درکردستـان؛ ٢) یونجهٔ خودرو.

**هەسپك:** وێنجەکێویلە، هەسپست ف یونجهٔ خودرو.

**هەسپێ:** ئەسپێ، سپێ ف شپش.

**هەسپێ ئێختە:** ئەسپی گوندەرهاتی ف اسب اختەشده.

**هەسپێ بەزا:** ئەسپی گرێوەغار ف اسب مسابقه.

**هەسپێ حەشا:** ئەسپی ئێختەکراو ف اسب اخته.

**هەسپێ دارین:** پایسکڵ، دوچەرخە ف دوچرخه.

**هەسپێ فەحل:** ئەسپی تۆوی بۆ پەڕینەسەر ماین ف اسب جفتگیری.

**هەسپێ قوله:** ئەسپی شێ ف نژادی از اسب.

**هەسپێ کەحێل:** ئەسپی ڕەسەن ف اسب اصیل.

**هەسپێ گونۆ:** هەسپێ ئێختە ف اسب اخته شده.

**هەسپێ مێ:** ماین ف مادیان.

**هەسپێ نێر:** ئەسب ف اسب.

**هەسپێ نەیی:** تاژیلۆکە، حوشترخوا، تاژی ئەحمەدڕاوکەرە، باڵۆك، ئەسپی حەسەن حوسێنان ف حشرهٔ آخوندك.

**هەست:** ١) دارایی، بوٗ؛ ٢) ئاگا، حەس؛ ٣) ئێسقـان، پێشە، ئێسك؛ ٤) توند، هەس؛ ٥) هەشت. حەفت و یەك ف ١) موجودی؛ ٢) احساس؛ ٣) استخوان؛ ٤) غلیظ؛ ٥) هشت.

**هەسْت:** هەتە ف داری.

**هەستار:** ڕۆندك، فرمێسك ف اشك.

**هەستـان:** ١) رابـوُن، هاتنـەسـەرپا؛ ٢) بێداربوُنەوە لە خەو؛ ٣) زەق و ڕەپ بوُن؛ ٤) هەتـانە ف ١) برخاستن؛ ٢) بیدارشدن از خواب؛ ٣) راست شدن؛ ٤) دارید.

**هەستـاندن:** ١) راکردن، بڵندکردن بەقیتەوە؛ ٢) لە خەو ڕاپەڕاندن؛ ٣) ڕەپ و ڕاست ڕاگرتن؛ ٤) ئەستـانـدن، سانـدن ف ١) بلندکردن؛ ٢) بیدارکردن؛ ٣) راست و مستقیم نگهداشتن؛ ٤) گرفتن.

**هەستاندنەوە:** هەستاننەوە ف نگا: هەستاننەوە.

**هەستاننەوە:** ١) دوای کەوتن بڵندکردنەوە؛ ٢) ئەستاندنەوە ف ١) پس از افتادن بازبلند کردن؛ ٢) بازگرفتن.

**هەستـانـەوە:** ١) دوای کەوتن ڕابـوُن؛ ٢) لە نەخۆشی ڕزگاربوُن؛ ٣) زێنـدوبـوُنەوە دوای مردن؛ ٤) وەخەبەرهاتن بۆ پارشێو ف ١) بعد از افتادن بلند شدن؛ ٢) شفایافتن؛ ٣) قیامت؛ ٤) بیدارشدن برای سحری.

**هەستای:** هەشتا، چوارچەل بیست ف هشتاد.

**هەسْتك:** هێچك، ئاڵقەی گوریسی بارەوباران، هەچی ف حلقهٔ رسن باربند.

**هەستکار:** ئەندامی کە هۆی هەستکردنن ف اندامهای حسّ کننده، حواسّ.

**هەست کردن:** حەس کردن، پێ زانین، ئاگاکردن ف احساس کردن.

**هەستو:** ١) پێشە، ئێسقان، هەست؛ ٢) دەنکی ڕەقی میوە، ناوکەمیوە ف ١) استخوان؛ ٢) هسته.

**هەستۆ:** مل، ئەستۆ ف گردن.

**هەستوخوست:** دەنگ و بزوُتن ف حرکت و صدا.

**هەستۆك:** هەستکار ف نگا: هەستکار.

**هەستونْست:** بوُن و نەبوُن ف هست و نیست، موجودی.

**هەستونیست:** هەستونْست ف هست و نیست.

**هەستە:** ١) ئەستێ بۆ پوُشوُ؛ ٢) راستەوەبە؛ ٣) ئەسپایی، لەسەرخۆ؛ ٤) هەتە؛ ٥) پێشە، ئێسقان ف ١) آهن آتش‌زنه؛ ٢) بلندشو؛ ٣) آهسته؛ ٤) داری؛ ٥) استخوان.

**هەستەر:** ئێستر، قاتر ف استر.

**هەستەرە:** موس، گوێزان، گیزان، تیخی موُتاش ف استره.

**هەستـەکـا:** لەو گونـدانـەی کوردستـانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**هەستەم:** ١) دژوار: (کەژێ **هەستەمە**)؛ ٢) ئەسپایی، سپایی، ئاستەم ف ١) سخت و دشوار؛ ٢) آهسته.

**هەستەی:** توندو شلی تێکەڵاو، تیر تێکەڵ بە تراو ف غلیظ و رقیق مخلوط.

**هەستی:** ١) ئێسك، پێشە؛ ٢) بوُن؛ ٣) راستەوەبی ف ١) استخوان؛ ٢) هستی، وجود؛ ٣) بلندشوی.

**هەستێ:** ١) ئەستێ، بەردەستێ، هەستـــە؛ ٢) راستـەوەبێ ف ١) آهن آتش‌زنه؛ ٢) بلند شود.

**هەستیار:** ١) هەستـۆك، هەستکار؛ ٢) شاعیر، وێژەوان ف ١) احساس کننده؛ ٢) شاعر و ادیب.

**هەستێس:** هەژدە ف هیجده.

**هەستی سْقـــك:** خوێن شیرین، ڕەزاسـوُك، ئێسـك سوُك ف دوست داشتنی، تودل برو، محبوب‌القلوب.

**هەستیف:** ١) ئەستێوْڵـك، ئاسنێ کە بەسـەر تەنوُرا ڕای‌دەنگێون؛ ٢) ئاسنێ کە نانی پێ لە تەندوُر دەکەنەوە ف ١) آهنی که بر بالای تنور می گذارند؛ ٢) آهنی که بدان نان از تنور بیرون کشند.

**هەستیڤ:** هەستیف ف نگا: هەستیف.

**هەستیك:** هێچك، هەسْتك ف نگا: هەسْتك.

**هەستی کۆژ:** ١) کڕکڕۆکە؛ ٢) دەوری لێس، برێتی لە زۆرخۆر ف ١) غضروف؛ ٢) کنایه از پرخور.

**هەستی کۆلی:** ئێسك شکاو، ئێسك ڕزاو ف شکسته استخوان، پوسیده استخوان.

**هەستی گران:** خوێنتـاڵ، ڕەزاقورس، ئێسك گران، ڕەزاگران ف دوست نداشتنی، گرانجان.

**هەستی گرتن:** شکستەبەندی ف شکسته بندی.

**هەستی گرەك:** هۆستای شکستەبەند ف شکسته بند.

**هەستی گەشتْك:** پەل قەوی، پێشەئەستوُر ف استخوان درشت.

**هەستێن:** ١) ئەستێن، وەگر؛ ٢) لە خەو بێدارکـەر؛ ٣) بڵنـدکەر ف ١) گیرنده؛ ٢) بیدارکننده؛ ٣) بلندکننده.

**هەستێنەوە:** ئەستێنـەوە: (تۆڵەهەستێنـەوە، تاڵان**هەستێنەوە**) ف بازگیرنده.

**هەستێوك:** وردەئێسك ف ریزه استخوان.

**هەس دان:** گەڕاندنەوەی گا لەسەر خەت ف برگرداندن گاو شخم‌زنی از مرز شیار.

**هەس دانـــەوە:** ١) هەس‌دان؛ ٢) برێتی لە ڕوشکـانـدن و تەمێ کردن؛

(زۆری وت ئاخری **هەسم دایەوە**) ف ۱) نگا: هەس‌دان؛ ۲) کنایه از جواب دندان شکن دادن.

**هەسر:** ۱) ئەسرین، رۆندك، ئەشك، فرمێسك؛ ۲) عەزرەت، تاسە؛ ۳) نزگەرە؛ ۴) هەڵکێشـانی ئاخ ف ۱) اشـك؛ ۲) آرزو، حسـرت؛ ۳) سکسکه؛ ۴) آه کشیدن.

**هەسرئانتش:** ئاخ هەڵکێشان ف آه کشیدن.

**هەسربیایش:** دەرکردن، لە خۆ دوورخستنەوە ف راندن، از خود دور کردن.

**هەسروێ:** خەزوور ف پدرزن و پدرشوهر.

**هەسری کەردش:** فرمێسك دەچاوی تزا ف اشك درچشمانش غلطید.

**هەسك:** ۱) شەن، شەنە؛ ۲) پشافتە، هەڵپشاوتە؛ ۳) ئەسکوێ: (دیزکێ گوت زکێ من سپی‌یە **هەسکێ** گوت ئەزهێ ژێ دەرکەتم) «مەسەل» ف ۱) افشون؛ ۲) مچالەشدە؛ ۳) چمچە، ملاغه.

**هەسکاندن:** پشافتن، هەڵپشاوتن ف مچاله‌کردن، با دست فشردن.

**هەسکۆ:** ئەسکوو، ئەسکوێ ف ملاغه.

**هەسکوێ:** هەسکۆ، ئەسکوو ف ملاغه.

**هەسکـە:** ۱) ئانیسـك، دەنگێ لە قورگ لەخـۆشیان یان پاش گریان، هەنیسك؛ ۲) ئەسکوێ، هەسکۆ ف ۱) خنجه، سکسکهٔ بعد از گریه؛ ۲) ملاغه.

**هەسکەهەسك:** هەسکەی زۆر ف خنجهٔ متوالی، سکسکهٔ پیاپی پس از گریه.

**هەسکێ:** گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**هەسکیان:** ئانیسك‌دان ف خنجیدن، سکسکه‌کردن بعد از گریه.

**هەسکیف:** ناوی کۆنـەقـەڵایەکی دەسکـردی پادشـایانی ئەییوبیە لە شاری ماردین لە دەم چەمی دجلە کە هەر ماوە ف نام قلعه‌ای مربوط به سلاطین ایّوبی در کردستان.

**هەسن:** ئاسن ف آهن.

**هەسنـا:** هۆزێکی کوردە لای جزیری بۆتـانی کوردستـانی بەردەستی ترکان ف نام عشیره‌ای در کردستان.

**هەسن‌بەکـرا:** لەو گونـدانـەی کوردستـانـە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**هەسن‌پیرکـا:** گونـدێکـە لە کوردستـان بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**هەسن‌جاو:** ئاسنجاو، ئامرازی ماڵ لە ئاسن و مس و کانزای‌تر ف ابزار فلزی.

**هەسن‌درك:** تێلێکی بەچقڵ کە دەکرێتە پەرژین ف سیم خاردار.

**هەسن‌فڕێن:** ئاسن‌کێش ف آهن‌ربا.

**هەسنکەر:** ئاسنگەر ف اهنگر.

**هەسنگ:** هەسن، ئاسن ف آهن.

**هەسنگەر:** ئاسنگەر ف آهنگر.

**هەسنی:** ۱) ئاسنین، چێبوی ژ ئاسن؛ ۲) عاشیرەتێکی کوردە ف ۱) آهنی؛ ۲) نام عشیره‌ای است.

**هەسو:** ۱) کەنارەی عاسمان، ئاسۆ، ئاسۆگ، ئاسۆ؛ ۲) لۆکەی ناوئاخنی جلك ف ۱) افق؛ ۲) پنبهٔ میان رویه و آستر لباس.

**هەسوود:** ئێرەیی‌بەر، چاونەزێر ف حسود.

**هەسوودی:** ئێرەیی، چاونەزێری ف حسودی.

**هەسوورە:** خەزوور ف پدرزن و پدرشوهر.

**هەسووك:** گیایەکی کێویە ف گیاهی است.

**هەسوون:** ۱) ساوین، پیامالین؛ ۲) ئەستون، کۆڵەکە، ئەستوندەك ف ۱) مالیدن، ساییدن؛ ۲) ستون.

**هەس‌ونس:** هەست‌ونست ف هست و نیست.

**هەس‌ونیس:** هەس‌ونس، هەست‌ونست ف هست و نیست.

**هەس‌ونیە:** هەست‌ونست ف هست و نیست.

**هەس‌وهوڵ:** خەست‌وخوڵ ف غلیظ، ضدّ آبکی.

**هەسویی:** کێڕی، راست‌و لەدرێژەوە ف افقی.

**هەســـە:** ۱) خاوەن‌بوونـــە، هەس؛ ۲) هەستـە. بڵنـدبـە؛ ۳) خەستـە. خەستەوەبوگ ف ۱) هست؛ ۲) برخیز؛ ۳) غلیظ شده، آب چکیده.

**هەسەر:** ۱) ئێستر، قاتر، بەچکەی نێرەکەر لە ماین؛ ۲) بیر و خەیاڵات ف ۱) استر؛ ۲) فکر و خیال.

**هەسەم:** هەرەس ف ۱) بهمن؛ ۲) ریزش بهمن.

**هەسەڵ:** هنگڤ، هنگڤین ف عسل.

**هەسەلە:** مەلێکی بچوکە، تیتر واسك ف پرنده‌ایست کوچك.

**هەسەن:** ناوە بۆ پیاوان، حەسەن ف حسن، نام مردانه.

**هەســەنـان:** چەنـد تیرەو هۆزەکـورد بەوناوە هەن لە نێوان وان و چیای ئاگری‌و دێرسیم‌و سقـەرەکێ کە دوتیرە لەوانـە زازان ف نام چنـدین عشیرهٔ کورد.

**هەسەن‌بەگی:** گیائادەمە ف مهرگیاه.

**هەسەنی:** جۆرێ هەنگوور ف نوعی انگور.

**هەسهەس:** هەس، نێشکگری شەو ف عسس.

**هەسهەسووك:** برێتی لە شاخی بزنەکێوی‌و کەڵەکێوی ف کنایه از شاخ بزکوهی.

**هەسـی:** ۱) بوون؛ ۲) لایەتی، شك‌دەبـا، دێرت، دێرێ ف ۱) هستی، وجود؛ ۲) دارد.

**هەسیا:** هەستی‌پێ‌کرد، ئاگادارەوەبو، پەلیا ف احساس کرد.

**هەسیان:** ۱) ئاگاکردن، حەسیان؛ ۲) حەسانەوە، سانەوە ف ۱) احساس کردن؛ ۲) آسودن.

**هەسیانەڤە:** حەسانەوە، سانەوە ف آسودن.

**هەسێب:** حسێب، حیساب ف حساب.

**هەسێب‌گەر:** ژماریار ف آمارگر، حسابگر.

**هەسێب‌گێڕ:** حەسێب‌گەر، ژماریار ف حسابگر، آمارگر.

**هەسیدە:** هەڵوای لە ئاردو دۆشاو ف حلوای آرد و شیره.

**هەسیر:** ۱) حەسیر، رایەخی لە جەگەن‌و قامیش؛ ۲) یەخسیر، دیل ف ۱) حصیر، بوریا؛ ۲) اسیر.

**هەسێر:** ئەستێر، گۆلاو، ئەستێلْ [ف] استخر.
**هەسیرۆ:** خەزوْر، خەزوْرە [ف] پدرزن و پدرشوهر.
**هەسیرە:** ئەستێرە، ستارە، هەسارە [ف] ستارە.
**هەسێرە:** هەسیرە، ئەستێرە، هەسارە، ستارە [ف] ستارە.
**هەسێرەزێڕینە:** پەلکەزێڕینە، کێرستو ن، کەسکەسوْر [ف] رنگین کمان.
**هەسێلْ:** ئەستێر، گۆلاو، ئەستێلْ [ف] استخر.
**هەسین:** هەست کردن [ف] حس کردن.
**هەسێنە:** خەستە، خەستەوەبوْگ [ف] غلیظ شدە، آب چکیدە.
**هەش:** ۱) خم، گیایەکە بۆ ڕەنگی شین دەکار دەکرێ، خوم؛ ۲) هۆش، هش؛ ۳) حەش، ورچ، هەرس، هرس، حورچ؛ ۴) وتـەی دنـەدانی سەگ؛ ۵) فەرمان بە بێدەنگ بوْن [ف] ۱) نیل؛ ۲) هوش؛ ۳) خرس؛ ۴) کلمهٔ برانگیختن سگ؛ ۵) هیس، فرمان خاموشی.
**هەشا:** هاشا، حاشا [ف] حاشا.
**هەشار:** ۱) حەشار؛ ۲) وشیار؛ ۳) خوْون کردن: (**خوّی حەشار داوە**) [ف] ۱) کمین کبك شکاری؛ ۲) هشیار؛ ۳) پنهان شدن.
**هەشاردان:** شاردنەوە، وەشارتن [ف] پنهان کردن.
**هەشارگە:** حەشارگە [ف] کمینگاە.
**هەشارە:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد [ف] روستایی در کردستان کە بعثیان آن را ویران کردند.
**هەشاشین:** بەڵاو چوْرتم [ف] بلا و معصیبت.
**هەشـافتن:** ۱) قڕکـردن، لەناوبردن؛ ۲) بن قوڕدان [ف] ۱) نابودکردن، کشتار دستەجمعی؛ ۲) زیر گِل بردن.
**هەشامات:** ئاپۆرە، حەشامات [ف] انبوهی مردم، جمعیّت متراکم.
**هەشان:** ئاخنین، خستنەناو بەزوّر [ف] آگنە.
**هەشاندن:** ۱) تێ ئاخنین؛ ۲) پڕکردنەوە [ف] ۱) آگندن با فشار؛ ۲) بازپر کردن.
**هەش بەسەر:** ۱) برێتی لە بەدبەخت؛ ۲) برێتی لە تازیەبار [ف] ۱) کنایە از سیەروز؛ ۲) کنایە از ماتم‌زدە.
**هەشپـا:** جلە، جانـەوەرێکە لە دەریادا لە هەرلایەی چوار پەلی هەیە [ف] اختاپوس، هشت پا.
**هەشپاڵو:** دە گۆشەی دوگۆشە کەم [ف] هشت گوشە.
**هەشپش:** هەسپێ، سپێ [ف] شپش.
**هەشپشی:** ئەسپێ، سپێ، هەشپش [ف] شپش.
**هەشت:** دوان و شەش، دوجار چوار [ف] عدد هشت.
**هەشتا:** دە جار هەشت، حەفتاو دە [ف] هشتاد.
**هەشتاڵو:** خۆخ، کۆخ، قۆخ [ف] هلو.
**هەشتاڵوکوت:** لەتکەخۆخ [ف] برگهٔ هلو.
**هەشتامین:** پاش حەفتاو نۆهەمین [ف] هشتادمین.
**هەشتاو:** لەز، پەلە [ف] شتاب.
**هەشتاوی:** بەلەز، بەپەلە [ف] شتابزدە.
**هەشتای:** هەشتا، هەشتێ [ف] هشتاد.
**هەشتاێن:** هەش‍ ‍ەم، هەشتامین [ف] هشتادمین.
**هەشتایەم:** هەشتامین [ف] هشتادمین.
**هەشت پەڕ:** گەوڵـەجـۆ، جۆیێ کە شەش ڕیز دەگری و بە دێم نابێ [ف] نوعی جو کە خوشهٔ آن شش ردیف دانە دارد.
**هەشتر:** حوشتر، وشتر، دەڤە [ف] شتر.
**هەشترمە:** وشترمر [ف] شترمرغ.
**هەشت تیر:** جۆرێ دەمانچە کە هەشت فیشەك دەخوا [ف] نوعی کلت.
**هەشت دان:** هەشت پەڕ [ف] نگا: هەشت پەڕ.
**هەشت قات:** هەشت نهۆم، هشت چین [ف] هشت طبقە.
**هەشت قۆزی:** هەشت پاڵو [ف] هشت گوشە.
**هەشت گۆشە:** هەشت پاڵو، هەشت قۆزی [ف] هشت گوشە.
**هەشت لا:** هەشت توێ [ف] هشت لایە.
**هەشتم:** دێرمیش: (**هەشتم** و نات دەمێ)؛ ۲) ئەوی لە نورەژمارەدا دەبێتە هەشت [ف] ۱) آن را دارم؛ ۲) هشتم.
**هەشتن:** هەشتەم، ئەوی لە ژماردا دەبێتە هەشت [ف] هشتم.
**هەشتنە:** هەشتن، هەشتم [ف] هشتم.
**هەشتـە:** ۱) هەشت ڕۆژ دوای ڕوداوێ یان بۆ وەخت دانـان: (حەوت ڕۆژ لەماڵم **هەشتە** لەکن توّم)؛ ۲) شکیش دەبەی: (**هەشتە**و نامدەیەی) [ف] ۱) هشتم روز؛ ۲) آن را نیز داری.
**هەشتەك:** لە هەشت یەکێك، هەشتێك [ف] یك هشتم.
**هەشتەم:** ئەوی لە ژماردا دەبێتە هەشت [ف] هشتم.
**هەشتەمین:** هەشتەم [ف] هشتمی.
**هەشتی:** ۱) زل و گوشاد. *بۆ زۆری گوشادو سەماوەری گەورەی دەڵێن*؛ ۲) هەشت گۆشە؛ ۳) دێریتش، لاشی هەیە؛ ۴) هەشتا [ف] ۱) خانە یا سماور بزرگ؛ ۲) هشت گوشە؛ ۳) نیز دارد؛ ۴) هشتاد.
**هەشتێ:** هەشتا، هەشت چەل دە، چوارچەل بیست [ف] هشتاد.
**هەشتیر:** هەشت تیر، جۆرێ دەمانچە [ف] نوعی کلت.
**هەشتێس:** هەژدە [ف] هیجدە.
**هەشتێسن:** هەژدەهەم [ف] هیجدهم.
**هەشتێسنە:** هەژدەهەم [ف] هیجدهم.
**هەشتێك:** لە هشت پاژ پاژێك [ف] یك هشتم.
**هەشتینەك:** هەچیەك لە هەشت پاژی وەك یەك پێك هاتبێ [ف] متشکّل از هشت بخش متساوی.
**هەشتیەك:** هەشتێك [ف] یك هشتم.
**هەشدە:** هەشتا، هەشتێ، هەستای [ف] هشتاد.
**هەشـر:** ڕۆژی هەستـانـەوە، حەشـر. *زۆرتـر دەگەڵ مەشـەری ئێژن کە مەبەست مەحشەرە* : (**هەشرو مەشەر**) [ف] روز رستاخیز.
**هەشف:** ۱) سڕین، ماڵینـەوە؛ ۲) کوژانـدنـەوەی نوسـراو؛ ۳) نەمان و لەناوچوْن [ف] ۱) زدودگی؛ ۲) پاك کردن نوشتە؛ ۳) نابودی.
**هەشفـانـدن:** ۱) سڕینـەوە، سڕینـەوەی خەت یان چڵك و ژەنگ؛ ۲) قڕان تێ خستن، لەناوبردن؛ ۳) تێ ئاخنین، ئاخنین [ف] ۱) زدودن؛ ۲) نابودکردن؛ ۳) آکندن.
**هەشفی:** سڕاو [ف] زدودە.

**هەشفین:** هەشفاندن [ف] نگا: هەشفاندن، زدودن.
**هەشفێن:** ئەوی شتێ دەسڕێتەوە [ف] زداینده.
**هەشڤاندن:** هەشفاندن [ف] نگا: هەشفاندن.
**هەشك:** ۱) چیلکەوچاڵ، هەژگەڵ؛ ۲) چەرمی قاچ و دەست لە پێستەدا [ف] ۱) شاخەهای خشك شده؛ ۲) چرم دست و پای خیك.
**هەشمەت:** خولام، گۆری: (**هەشمەت** کارێ بەژنێ تەمە) [ف] نوکر.
**هەشە:** لەبوُنیش‌دایە [ف] هم هست.
**هەشەری:** حەشەری، ژنی زۆر حەکەدار [ف] زن شهوت‌پرست.
**هەشەکە:** هەڕەشە، گەف، گوڕەشە [ف] تهدید.
**هەشی:** شین، کەوە، بەڕەنگی هەش [ف] کبود.
**هەشیر:** حەسیر لە جەگەن یان لە چیتك [ف] حصیر، بوریا.
**هەشیمی:** ترخێنـە: (**هەشیمی** گەلاپانی قەدیمی خوت لێ هاویشتوُمە سەرتەختی سیمی) «فولکلوڕ» [ف] آش شلغم، ترخوانه.
**هەشین:** ۱) هەشی؛ ۲) سەوز، کەسك: (گیا **هەشین** بویە) [ف] ۱) کبود؛ ۲) سبز.
**هەشیناتی:** سەوزەوات [ف] سبزیجات.
**هەشینایی:** کەوەیی، شینی، ڕەنگی عابی تۆخ [ف] کبودرنگی.
**هەشین‌بوُن:** ڕوان، شین‌بوُنی ڕوەك [ف] رستن نباتات.
**هەشینوك:** جۆرێ ماسی، تەحرێ ماساو [ف] نوعی ماهی.
**هەف:** ۱) عەف، حەپ، حەبە، گەفە؛ ۲) خەو [ف] ۱) واق سگ؛ ۲) خواب.
**هەفار:** ۱) بۆخ، مژی گەرما، بۆخی ئاوی گەرم؛ ۲) بۆنی گرانی تەڕی و ڕزاو لەبەر تەڕی [ف] ۱) بخار؛ ۲) بوی گند از رطوبت.
**هەفان:** جانەوەری چنگ بەبەردان سواو [ف] جانور ساییده چنگال.
**هەفت:** ۱) حەوت، حەو؛ ۲) خەوت، نوست، نڤست [ف] ۱) هفت؛ ۲) خوابید.
**هەفتا:** حەفتا [ف] هفتاد.
**هەفتـاچـەشمە:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد [ف] روستایی درکردستان که بعثیان آن را ویران کردند.
**هەفتاف:** حەوتاو، هەفتاو [ف] هفت بار شستن نجس.
**هەفتانە:** بە حەورۆژ جارێ [ف] هفتگی.
**هەفتانی:** هەفتانە [ف] هفتگی.
**هەفتاو:** گلاوکردن، بە حەوت ئاو شوتن، هەفتاڤ [ف] هفت بار شستن نجس.
**هەفت‌برا:** حەوبرالە [ف] بنات‌النّعش.
**هەفتجوُش:** حەوجۆش [ف] مفرغ.
**هەفتڕو:** حەوت‌ڕو، برێتی لە مەرایی کەر، ڕوُبین [ف] هفت رخسار، کنایه از متملّق و ریاکار.
**هەفتك:** پاشەروکی میوە [ف] تەماندهٔ میوه.
**هەفتلۆ:** ۱) حەوچین لەسـەر ئێکتـر؛ ۲) حـەوت‌لۆ، پەڕی قومـاری حەوت‌خاڵ [ف] ۱) هفت لایه برهم؛ ۲) ورق هفت خال گنجفه.
**هەفتو:** ۱) حەوتو؛ ۲) حەوت‌لۆیە؛ ۳) خەوتو [ف] ۱) هفته؛ ۲) هفت لایه برهم؛ ۳) خوابیده، خفته.
**هەفتوُش:** ۱) هانەدان بۆ جاڕزو توُڕەکردن؛ ۲) توُش بەتوُشەوەبوُن [ف] ۱) برانگیختن؛ ۲) برخورد، گرفتار و درگیرشدن.
**هەفتوك:** ۱) هەفتانە؛ ۲) سەعاتێ کە بە حەورۆژ جارێ قورمیش دەکرێ؛ ۳) گەمەیەکی زارۆکانە [ف] ۱) هفتگی؛ ۲) ساعت هفته کوك؛ ۳) نوعی بازی کودکانه.
**هەفتوێ:** حەوت توێ، حەوت چین لەسەر یەك [ف] هفت پردهٔ نازك روی هم، هفت لایه.
**هەفتوێخ:** ۱) هەفتوێ؛ ۲) ناوی برینێکی زۆر پیسە [ف] ۱) هفت لایه؛ ۲) نوعی زخم بد و کثیف.
**هەفتوُیش:** هەفتوُش [ف] نگا: هەفتوُش.
**هەفتە:** ۱) حەوتو، حەوتە؛ ۲) خەوتو، نوستو [ف] ۱) هفته؛ ۲) خوابیده، خفته.
**هەفتەخار:** گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد [ف] از روستاهای ویران شدهٔ کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.
**هەفتـەغـار:** شارۆکێکی کوردستانە بەعسی کاولی کرد [ف] شهرکی در کردستان که به دست بعثیها ویران شد.
**هەفتەکوك:** هەفتوك، سەعاتێ کە بە حەورۆژ جارێ قورمیش دەکرێ [ف] ساعت هفته‌کوك.
**هەفتەکێش:** لەفەحل کێشانی ماین و ماکەر لەو حەوتەدا کە بێچوی بوە [ف] گشن‌دادن مادیان و ماچەخر در هفته‌ای که زاییده است.
**هەفتەن:** خەوتن، نوستن [ف] خفتن، خوابیدن.
**هەفتـــەنیش:** گونـــدێکـــە لە کوردستـان بەعسی وێرانی کرد [ف] از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.
**هەفتەیی:** هەفتانە [ف] هفتگی.
**هەفتێ:** هەفتا، حەفتا، حەفتێ [ف] هفتاد.
**هەفتیار:** ۱) کەمتیار؛ ۲) برێتی لە ژنێ کە دەگەڵ زۆران حەزلێکردوُیی دەکا [ف] ۱) کفتار؛ ۲) کنایه از زنی که عشّاق بسیار دارد.
**هەفتیر:** جۆرێ دەمانچە کە حەوفیشەك دەخوا [ف] کلت هفت‌تیر.
**هەفتیك:** گەمەیەکی زارۆکانە بە قاشولکە دەیکەن [ف] از بازیهای کودکان.
**هەفدین:** ۱) داپۆشینی دەفر، قەپاغ لەسەردانان؛ ۲) پیوەدانی دەرك [ف] ۱) درپوش روی ظرف گذاشتن؛ ۲) بستن در.
**هەفری:** جۆرێ ماساو، تەحرێ ماسی [ف] نوعی ماهی.
**هەفرید:** عیفریت، دێو، زەبەلاحی ناو کۆنەچیرۆکان [ف] عفریت، دیو.
**هەفس:** ۱) گرتوخانە؛ ۲) گراو [ف] ۱) زندان؛ ۲) زندانی.
**هەفسار:** ئەوسار، پەتی بەستن و ڕاکێشانی ماڵات [ف] افسار.
**هەفسخانە:** زیندان [ف] زندان.
**هەفسی:** بەندی، گراو [ف] زندانی.
**هەفشی:** حەوشە، پەچە، هەسارگەلە [ف] شبغاز.
**هەفقاس:** هەڤقاس، ئەوقاس، ئەوەند، ئەمەنگە [ف] اینقدر.
**هەفك:** ۱) ئەوك، قورگ؛ ۲) مل، گەردن [ف] ۱) بیخ گلو؛ ۲) گردن.

**هەفك ئەستوڕ:** مل قەوی ف گردن کلفت.

**هەفکویك:** ئاردێ کە ئەنگوتکی تێوەردەدن ف آردی کە چونە بدان آلایند.

**هەفکین:** هەفکویك ف نگا: هەفکویك.

**هەفل:** قرتاك و دارکی هێشوی ترێ و خورما ف چوب خوشهٔ انگور و خرما.

**هەفن:** بۆگەنیو ف بوی بد.

**هەفنی:** بۆگەنیو بۆگ، گەنیو ف گندیده.

**هەفوری:** ۱) تەگە، خەرت، نێری فەحل: ۲) فیلەگێژە، شوڕ ف ۱) تکە، نرەبز فحل؛ ۲) نگا: فیلەگێژە.

**هەفهەف:** حەپەحەپ ف واق واق سگ.

**هەفهەفی:** تەماحکار ف آزمند.

**هەفهەفیاتی:** چلێسی، چەورەیی ف شکم‌پرستی.

**هەفی:** گەورەمار، ئەژدەها ف مار بزرگ.

**هەفیك:** ستۆکورك ف نای، خرخره.

**هەڤ:** ۱) ئاو، هاو، وتەی شەریکی و وێچوون؛ ۲) وتەی دەگەڵی، پێکەوە؛ ۳) هەب، دەنك، دانە ف ۱) هم، مانند، کلمهٔ اشتراك؛ ۲) با هم؛ ۳) دانە، حبّە.

**هەڤ ئاواز:** هەوای گۆرانی بەکۆمەڵ و ڕێك و پێك ف آواز دستەجمعی و منظّم.

**هەڤار:** ۱) هاوار؛ ۲) زۆزان، هاوینەوار ف ۱) فغان؛ ۲) ییلاق.

**هەڤاری:** کۆمەگ، یاریدە: (خودێ بەکو دهەڤاریا من هات نەخۆ ئەز شەرپەزە بوم) ف یاری، کمك.

**هەڤاف:** کەسێ کە ماڵی لە کەنار دەریا یان لە قەراخ چەمە ف ساکن کنار دریا یا رودخانە.

**هەڤال:** ئاواڵ، هاڤال ف رفیق، یار.

**هەڤاڵ:** هەڤال ف رفیق، یار.

**هەڤالا:** بەزمی بوك گوێزانەوە ف جشن عروسی.

**هەڤال بچوك:** ۱) منداڵدان؛ ۲) ئاواڵ منداڵ؛ ۳) سەراوی تازەزاو ف ۱) بچەدان، رحم؛ ۲) جفت جنین؛ ۳) کیسهٔ آب زائو.

**هەڤال بەند:** دۆستی سوێندخۆر و پەیماندەری ئاشنایەتی ف دوست قسم خوردە.

**هەڤال پشت:** ئاواڵ دوانەیەك کە ماوەیێ دوای ئەمی تریان لەدایك بوە ف یکی از دوقلوها کە مدّتی پس از دیگری بە دنیا آمدە باشد.

**هەڤال جەو:** ئاواڵ دوانە، جمك ف دوقلو.

**هەڤال جێو:** هەڤال جەو ف دوقلو.

**هەڤالداری:** لەسەر هەواڵ کردنەوە ف هواداری و پشتیبانی از رفیق.

**هەڤالزا:** جمك، دوانە، ئاواڵ دوانە، هەڤال جەو ف دوقلو.

**هەڤال زاڤا:** هەڤ لنگ، ئاواڵ زاوا، مێردی خوشکی ژنی مرۆڤ ف باجناق.

**هەڤال کراس:** ئاواڵ کراس ف شلوار زنانە.

**هەڤالو:** ئەی ئاواڵ ف ای رفیق.

**هەڤالوك:** ۱) سەراو، پەردەی منداڵدان؛ ۲) هەواڵ منداڵ کە لەدوای زان دەبێ دەرکەوێ ف ۱) کیسهٔ آب زائو؛ ۲) جفت نوزاد.

**هەڤالۆشك:** ئاواڵی خۆشەویست ف دوست صمیمی و بسیار نزدیك.

**هەڤالە:** گۆرانی بۆ بەڕێ کردنی وەوی ف ترانهٔ ویژهٔ راهی کردن عروس.

**هەڤالەتی:** ئاواڵەتی، دۆستایەتی ف دوستی، رفاقت.

**هەڤال هەڤالانی:** دەستە دەستە بون، لایەنگیری لە یەکتر کردن ف دستەبندی، دفاع از یکدیگر کردن.

**هەڤالی:** ۱) دۆستایەتی؛ ۲) هەڤالە، هەوایەکی گۆرانی بوك بەڕێ کردنە ف ۱) رفاقت؛ ۲) نگا: هەڤالە.

**هەڤالینی:** هەڤالەتی ف رفاقت.

**هەڤان:** ۱) همبان؛ ۲) حاوان؛ ۳) ئاونگ، دەسکاونگ، ئامرازی شت تێداکوتان؛ ۴) مایەفیتنەو شوفار، عەوان ف ۱) انبان؛ ۲) درپناە آرمیدن؛ ۳) هاونگ؛ ۴) فتنەانگیز.

**هەڤاندن:** حاواندنەوە ف پناە دادن، سرپرستی کردن.

**هەڤانە:** همبان، هەمبانە ف انبان.

**هەڤانی:** بەدفەڕی، شەیتانی کردن ف شیطنت.

**هەڤبەحر:** هاوبشك، هاوبەش ف شریك.

**هەڤبەر:** بەرانبەر ف برابر.

**هەڤبەرکی:** بەرانبەر پێ کردن، لەبەریەك دانان ف درمقابل هم قراردادن.

**هەڤبەز:** ۱) هاوڕۆژگار؛ ۲) هاوغار ف ۱) هم عصر، معاصر؛ ۲) شریك هم در دویدن.

**هەڤبەزم:** ئامپیاڵە ف هم پیالە.

**هەڤبەش:** هاوپاژ، هاوپشك ف شریك.

**هەڤبەشی:** شریکە ف شرکت.

**هەڤبەند:** ۱) هەواڵی زۆر نزیك؛ ۲) هاوکار؛ ۳) هاوزیندانی ف ۱) دوست صمیمی؛ ۲) همکار؛ ۳) هم‌بند در زندان.

**هەڤبەهر:** هەڤبەحر، هاوبەش ف شریك.

**هەڤپا:** ئامپا ف نگا: ئامپا.

**هەڤپار:** هەڤبەهر، هاوبەش، هاوبشك ف شریك.

**هەڤ پشت:** پشتیوان، ئاریکاری باش ف پشتیبان.

**هەڤ پشك:** هەڤبەحر، هاوبشك ف شریك.

**هەڤ پشکی:** شەریکی، هاوبەشی ف شراکت.

**هەڤ پەیالە:** هاودەم، هاواڵ و بەشدار لە خواردنەوەدا ف هم پیالە.

**هەڤ پیالە:** هەڤ پەیالە ف هم پیالە.

**هەڤ پیشە:** هاوسنعات ف هم پیشە، هم‌صنف.

**هەڤتا:** هاوتا، هاوشان ف همتا.

**هەڤتایی:** هاوتایی، هاوشانی ف همتایی.

**هەڤتونە:** ئاوا، ئاوەها ف اینچنین.

**هەڤتیرە:** هاوهۆز، لە یەك تیرەو بنەچەکە، هاوعاشیرەت ف هم‌طایفە.

**هەڤجاڕ:** نیر و ئامۆر ف خیش.

**هەڤ جڤات:** هاوکار لە کۆڕی کۆبونەوەدا ف همکار در انجمن و گردهمایی.

**هەڤ جڤـانـدن:** کۆکـردنەوەی کۆمەڵی مەردم لە شوێنێك ف گردآوردن جمعیت در یك نقطه، تشکیل گردهمایی.

**هەڤ جوُت:** ۱) هاوجوُت؛ ۲) هاوشانی، هاونرخی ف ۱) نگا: هاوجوُت؛ ۲) همتایی، هم‌ارزی.

**هەڤ جوُره:** تەواو لە چەشن ف کاملاً مشابه.

**هەڤجی:** هاووڵاتی ف همشهری.

**هەڤجیتی:** هاونیشتمانیەتی ف همشهریگری.

**هەڤچاخ:** هاوچەرخ، هاوزەمان ف معاصر.

**هەڤچاڤ:** چاڤێر ف مراقب.

**هەڤچاڤی:** چاڤێری ف مراقبت.

**هەڤ خستن:** لێکدان ف همدیگر را زدن.

**هەڤخوُ:** ئاکارو خدە وەکو یەکتر ف همخو.

**هەڤخەو:** مێردو ژن بۆ یەکتر ف همسر.

**هەڤ داخستن:** یەکتر لەعەردی‌دان لە زۆرانی‌دا ف همدیگر را درکشتی بر زمین زدن.

**هەڤدار:** هاوبەش ف شریك.

**هەڤدان:** لێك کۆکردنەوە ف بەدور هم جمع کردن.

**هەڤدل:** هاوئاوات ف همدل.

**هەڤدو:** ئێکتر ف همدیگر.

**هەڤدو بڕن:** کێ‌بەرکێ، ملە ف مسابقه، رقابت.

**هەڤدودان:** لەدوی‌یەك هاتن، یەك لەپاش یەك هاتن ف بەدنبال هم آمدن.

**هەڤدودانین:** لێکدانی چەند شتێ ف ترکیب.

**هەڤدودیتن:** چاو بە یەکتر کەوتن ف همدیگر را دیدن.

**هەڤدوُر:** لێك هەڵبڕاو ف دور از هم، ازهم جدا شده.

**هەڤدوُری:** لێك هەڵبڕان ف هجران.

**هەڤـدوگـرتن:** ۱) یەکترگرتن؛ ۲) یەکترگرتنەوە ف ۱) متّحدشدن؛ ۲) بازبهم رسیدن.

**هەڤدە:** ۱) حەڤدە؛ ۲) هەودا، ریس ف ۱) هفده؛ ۲) رشته.

**هەڤدەرد:** هاودەرد، خەمبار بە خەمی تۆوە ف همدرد.

**هەڤدەردی:** هاودەردی ف همدردی.

**هەڤ دەست:** یاریدەر، ئاریکار ف کمك کننده، یاور.

**هەڤ دەڤ:** همدەم، هەواڵی هاونشین ف همدم.

**هەڤدەسازی:** پارتایەتی ف سازمان.

**هەڤـــدەل:** ۱) ئاردو ئاوی پێکـــەوە کولاو، شۆربـاوئـارد؛ ۲) برێتی لە تێکەڵ‌پێکەڵی‌و چی بەسەرچێەوە ف ۱) آرد و آب مخلوط و جوشیده؛ ۲) کنایه از درهم برهمی وبی‌نظمی.

**هەڤدەم:** ۱) هاودەم، هەواڵی هەمیشەیی؛ ۲) هاوچاخ ف ۱) همدم؛ ۲) معاصر.

**هەڤدەن:** رەوتی هەڵبەست ف وزن شعر.

**هەڤدەنگ:** ۱) ئاوەدەنگی، خەمرەوین؛ ۲) لە بیر و باوەڕدا وەك یەك؛ ۳) چەنـد واتـایەکی لێك‌جیا لە یەك وشەدا ف ۱) همدم و غمگسار؛ ۲) همفکر؛ ۳) کلمه‌ای با معانی مختلف.

**هەڤدەهی:** حەڤدەهەم، دوای شازدەهەم ف هفدهم.

**هەڤدی:** هەڤدو ف همدیگر.

**هەڤدین:** هاوئاین ف همدین.

**هەڤر:** عەور ف ابر.

**هەڤڕ:** ئیر بار، قاپ‌و قاچاغی گڵین ف ظروف سفالی.

**هەڤڕا:** پێکەوە ف باهم.

**هەڤراز:** ۱) عەوراز، سەربەرەژوُرە؛ ۲) هەل ف ۱) سربالایی؛ ۲) فرصت.

**هەڤران:** سپیندار، سپیدار ف سپیدار، درخت تبریزی.

**هەڤڕان:** باراش ف بار غلّه ویژهٔ آسیاب.

**هەڤڕایی:** هاوبەشی، شەریکەی بازرگانی ف شرکت تجارتی.

**هەڤڕس:** دارێکی کێوی گەڵادەرزی‌یە لە سنۆبەر دەکا ف درختی است شبیه صنوبر.

**هەڤڕست:** ۱) هەڤڕس؛ ۲) هۆندراو، هۆنە ف ۱) نگا: هەڤڕس؛ ۲) بافته.

**هەڤڕك:** ۱) بەربەرەکانی کەر، ملەکەر؛ ۲) کێ‌بەرکێ کار ف ۱) هم‌چشم؛ ۲) شرکت کننده در مسابقه.

**هەڤڕکی:** بەربەرەکانی، رکەبەری ف هم‌چشمی.

**هەڤرگ:** جەرگ‌وناو ف دل و روده.

**هەڤرنگ:** برینگ، هەبرینگ ف دوکارد پشم‌چینی.

**هەڤڕو:** بەرەوڕو ف روبرو.

**هەڤروشی:** ئاوڕیش‌بوُن، شەڕ تێ‌هاڵاندن ف درگیرشدن، ستیز ایجاد کردن.

**هەڤڕوکرن:** بەروڕوکردنەوە ف روبروکردن.

**هەڤرونگ:** کڕ، فەسڵ، سەردەم، جەنگە ف فصل سال، موسم.

**هەڤڕە:** پێکڕا، تێکڕا، تەڤ ف باهم.

**هەڤرەمیش:** ئاوریشم ف ابریشم.

**هەڤڕەنگ:** هاوڕەنگ، دوکەس یا دوشت کە ڕەنگیان وەك یەکە ف همرنگ.

**هەڤڕەنگی:** برێتی لە دۆستایەتی گەرم ف کنایه از دوستی گرم، صمیمیّت.

**هەڤری:** ۱) وەك، وێچوُن؛ ۲) بەرماو، ئەوشتەی کە لە خواردنا بە پوُکەوە دەمێنێتەوە ف ۱) مانند؛ ۲) پس‌ماندهٔ خوراك روی دندان ولثه.

**هەڤڕی:** هاوڕێ ف همراه.

**هەڤڕێ:** ۱) هاوڕێ، هەڤالی سەفەر؛ ۲) دۆست ف ۱) همراه؛ ۲) دوست.

**هەڤـــڕیز:** بەشـــوێن یەکتـردا هاتنی وشـە لە نوُسین‌دا کە ڕێك‌و لەبـار یەکتر بگرنەوە ف بەردیف کنار هم قرارگرفتن کلمات در نوشتن.

**هەڤریسك:** هەوریس، داری عەرعەر ف درخت عرعر.

**هەڤڕیش:** ئاوڕیش، هاوڕیش ف نگا: هاوڕیش.

**هەڤریشك:** هەرمێشك، وڵینی نانی گەرم دەڕۆن‌دا ف نگا: هەرمێشك.

**هەڤریشم:** ئاوریشم ف ابریشم.

**هەڤڕێك:** هاوڕێ، هاوسەفەر ف همراه.

**هەڤرینگ:** برینگ، دوێردی خوری بڕینەوە ف دوکارد پشم‌چینی.

**هەڤزا:** هاوزا، هاوتەمەن ف هم‌سنّ و سال.
**هەڤزار:** خاوەنی یەك شیوە ئاخافتن ف همزبان.
**هەڤزاڤا:** هەولنگ، هاوزاوا ف باجناق.
**هەڤزك:** جمك، دوانە، جێڤی ف دوقلو.
**هەڤزمان:** هەڤزار ف همزبان.
**هەڤژاڵە:** هەوایەکی گۆرانی‌و لاوکە ف آهنگی است.
**هەڤژین:** ۱) سەرگەرم‌بوُن بەکارەوە، خەریك‌بوُن؛ ۲) هاوبەش‌لەژیاندا ف ۱) سرگرم کار شدن؛ ۲) شریك در زندگی.
**هەڤسار:** ئەوسار ف افسار.
**هەڤسال:** هاوبەرە، ئەوانەی کە لە تەمەندا نزیکی یەکن‌و لە زەمانێکا ئەژین ف همعصر.
**هەڤسرین:** رەق‌بوُن لەسەرمان ف از سرما یخ زدن.
**هەڤسۆژ:** خەمخۆر، دڵسۆز، یاری خۆشی‌و ناخۆشی ف دلسوز، غمخوار.
**هەڤسۆژی:** کاری هەڤسۆژ، دڵسۆزی ف دلسوزی، غمخواری.
**هەڤسۆند:** هاوسوێند، هاوپەیمان ف هم‌پیمان.
**هەڤسەر:** ۱) هاوجوُت، هەمسەر، هاوسەر؛ ۲) بەرانبەر ف ۱) همسر؛ ۲) برابر.
**هەڤسی:** جیرانی دەرك بەدەرکەوە ف همسایهٔ دیوار بەدیوار.
**هەڤسیایی:** هاوسایەتی، جیرانەتی ف همسایگی.
**هەڤسینوُر:** هاوکەوشەن، هاوحدوُد ف هم‌مرز.
**هەڤش:** حەوشەمەڕ ف شبغاز.
**هەڤشاری:** هاوشاری ف همشهری.
**هەڤشی:** پەچەمەڕ، هەڤش ف شبغاز.
**هەڤشیر:** خوشك‌و برای شیری ف خواهر و برادر رضاعی، همشیر.
**هەڤشین:** ئیشکە، نەخۆشی شیروشك‌بوُن ف بیماری شیرخشکیدن دام.
**هەڤ‌قاس:** ۱) ئەوەنـدە؛ ۲) هەرچەنـدە ف ۱) اینقـدر؛ ۲) هرچند، هرچقدر.
**هەڤ‌قۆزی:** هەمو گوشە بەرانبەر ف متساوی‌الزّوایا.
**هەڤك:** تەڵە، خەفك ف تله.
**هەڤکار:** هاوکار ف همکار.
**هەڤ کونجی:** هەڤ‌قۆزی ف متساوی‌الزّوایا.
**هەڤـکـێش:** ۱) لە تەرازودا کێش وەك‌یەك؛ ۲) بڕێتـی لە وێك‌چوُنـی ئاکـاری دوکـەس یا چەنـدکەس ف ۱) هم‌وزن؛ ۲) کنایە از تشابە اخلاقی دو یا چندنفر.
**هەڤکینْك:** هەفکین، پەینکە ف آردی کە بر چونە پاشند.
**هەڤگر:** ۱) یەکترگرتو؛ ۲) هەواڵەتی ف ۱) متّحد؛ ۲) رفاقت.
**هەڤ گرتن:** ۱) یەك‌ودو گرتن؛ ۲) یەکترگرتنەوە ف ۱) متّحدشدن؛ ۲) باز بهم رسیدن.
**هەڤ گرێدان:** لێك جوُت‌کردن، لێك نزیك‌کردنەوە ف بهم نزدیك کردن.
**هەڤگوڕ:** ئاریکاری دایمی ف همکار دائمی.
**هەڤ گوهارتن:** پێك‌گۆڕینەوە ف معاوضه.
**هەڤ گوهاستن:** جێگە پێك‌گۆڕینەوە ف معاوضهٔ جا.
**هەڤگهان:** ۱) پێك‌هاتن؛ ۲) گەیشتن بە یەکتر ف ۱) توافق؛ ۲) بهم رسیدن.
**هەڤ گهـاندن:** ۱) گەیاندنەیەکتر؛ ۲) گەیاندنەوە بە یەکتر ف ۱) بهم رسانیدن؛ ۲) بازبهم رسانیدن.
**هەڤگەل:** بـاتی، لەجیات، شتێ کـە بە شتێکـی‌تر دەگۆڕدرێتەوە ف درعوض.
**هەڤگەلی:** پێك‌گۆڕینەوە ف معاوضه.
**هەڤلنگ:** ئاواڵ‌زاوا ف باجناق.
**هەڤلیز:** هاوبازی، هاوگەمە ف همبازی.
**هەڤمـال:** ۱) هاوسـا؛ ۲) برابـەش لە ماڵدا ف ۱) همسایه؛ ۲) شریك درامول خانواده.
**هەڤ‌مانا:** چەند وشە کە یەك مانا دەدەن ف کلمات هم‌معنی.
**هەڤ‌ناسین:** پێکەوە بوُنەئاشنا ف باهم آشنا شدن.
**هەڤناڤ:** چەند کەسێ کە لە ناودا وەك یەکن، هاوناو ف همنام.
**هەڤندکا:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان کە بعثیان آن را ویران کردند.
**هەڤ‌نشین:** هاودەم، نزیك لە یەکتر ف همدم.
**هەڤ‌نڤیس:** دۆسیە، کۆمەڵەقاقەزی نوسراو لای میری لەبارەی کەسێ یا کارێکەوە ف پرونده.
**هەڤۆ:** پۆ، فرێت ف پود، رشتە.
**هەڤۆت:** بنەمای فێربوُن ف تعلیم.
**هەڤۆتکار:** ۱) فێرکەر، فێرکار، مامۆستا، سەیدا؛ ۲) ڕاهێنەر لە کار ف ۱) معلّم؛ ۲) مربّی.
**هەڤـۆتن:** ۱) فێرکـردن؛ ۲) فێربوُن: (ئوستادی عیشقێ دل **هەڤۆت**) «جزیری» ف ۱) تعلیم دادن؛ ۲) یاد گرفتن.
**هەڤۆتی:** راهێنراو، فێرکراو: (ئەڤ کاێ من نە **هەڤۆتی‌یە** جوحتی) ف تعلیم دیده.
**هەڤودن:** دەگەڵ یەکتر ف باهم، بە اتّفاق.
**هەڤودو:** ئێمەی دو پێکەوە ف مادونفر با هم.
**هەڤۆر:** کوُر، بزنی دوساڵەوەختە ف بزدوساله.
**هەڤوُری:** هەڤۆر ف بز دوساله.
**هەڤۆك:** ۱) رستە، چەندوتەیەك کە پیاوی لێ تێ‌دەگا؛ ۲) پارچەشێعرێ ف ۱) جملە: ۲) قطعه‌شعر.
**هەڤۆکابسەرخۆ:** رستەوشەی تەواو ف جملهٔ مستقل، جملهٔ کامل.
**هەڤۆکاڕێزکری:** زنجیرەڕستە ف جملات بە دنبال هم.
**هەڤۆکافەرمانی:** رستەیێ کە فەرمان بەکارێ دەدا ف جملهٔ امریّه.
**هەڤۆکاناڤکی:** ناوەڕستە ف جملهٔ اسمیّه.
**هەڤۆکاهۆکەری:** رستەیێ کە دەفر دەگەیێنێ ف جملهٔ ظرفیّه.
**هەڤۆکاهەکەنی:** رستەی مەرج‌و شەرت ف جملهٔ شرطیّه.
**هەڤۆل:** هاودین، هاومەزەب ف همدین.

**هەڤۆلی:** هاودینی، هاومەزەبی ف همدینی.
**هەڤە:** ئەنگۆ، ئێوە ف شما.
**هەڤ‌هاتن:** یەکترگرتن، یەکیەتی ف اتّفاق، اتّحاد.
**هەڤەر:** بزنی ڕەش‌و سپی، بەڵەك، بازگ ف بزخلنگ.
**هەڤەناف:** ناوی گشتی، دژی ناوی تایبەتی ف اسم عام.
**هەڤەهەسو:** بەرانبەر، هەمبەر ف برابر، مقابل.
**هەڤی:** دوژنی مێردێك بۆ یەکتر ف هوو.
**هەڤیاز:** لەسەر، بەلای ئەودا هاتگ ف ممتاز.
**هەڤیازی:** لەسەری، بەلایەکدا داهاتن ف امتیاز.
**هەڤیان:** ۱) ئۆقرەگرتن، هەدادان، داسەکنین، هێوربوونەوە؛ ۲) هەوێن، ئامیان ف ۱) آرامش؛ ۲) خمیرمایه، مایه.
**هەڤیان‌بوون:** ۱) هێدی‌بوونـەوە، ئۆقرەگرتن؛ ۲) هەڤێن‌بوونی شیر ف ۱) آرام گرفتن؛ ۲) بندآمدن شیر.
**هەڤیان کرن:** مەیاندن، هەوێن کردن ف بندآوردن شیر، شیر را به ماست یا پنیر تبدیل کردن.
**هەڤێدان:** تیرەیەك لە هۆزی زرکـان لە کوردی بەردەستی ترکـان ف طایفه‌ای از ایل «زرکان» در کردستان.
**هەڤیـر:** خەمـیر، هەویر، ئاردی تەڕکـراوی شێلدراو: (**ڤی هەڤیری ڕێ** گەلەك ئاف هلتینە) «مەسەلی‌بوتانی» ف خمیر.
**هەڤیربڕی:** شێوێکە لە نیسك‌و گزموڵەهەویر ف آش عدس و خمیر.
**هەڤیرترش:** ئامیانی هەویر ف مایهٔ خمیر.
**هەڤێرکان:** هۆزێکی مەزنە لەکوردستانی بەردەستی سووریاو ترکیادا ف ایلی بزرگ در کردستان.
**هەڤیرکە:** ۱) ئالی، دەوروبەر؛ ۲) گەو، کەمە ف ۱) اطراف و حوالی؛ ۲) حلقه.
**هەڤیرکەر:** هەڤیرشێل ف خمیرچلان، خمیرگیر.
**هەڤێرکی:** سەربە هۆزی هەڤێرکان ف منسوب به ایل «هەڤێرکان».
**هەڤیرۆ:** هەڤیری هەڵنەهاتگ ف خمیر برنیامده.
**هەڤیروك:** هەڤیرۆ ف خمیر برنیامده.
**هەڤێز:** پەچە، هەفشی، هەڤشی، حەوشەمەڕ ف شبغاز.
**هەڤێشك:** چیلکەو هەژگەڵ ف شاخهٔ خشك درختان.
**هەڤین:** ۱) ئامیان؛ ۲) ئەڤین، دڵـداری ف ۱) مایهٔ ماست و پنیر؛ ۲) عشق، دلدادگی.
**هەڤیندار:** ئەڤیندار، ئەویندار، بەندەوار ف عاشق، دلداده.
**هەڤینداری:** دڵداری، عەزلێکردوویی، ئەوینداری ف عاشقی، دلدادگی.
**هەڤین گەرم:** شێت‌و هار لەدڵداریدا ف واله.
**هەڤینی:** چۆنیەتی ژن دەگەڵ ژنە هاومێردەکەی، ژیانی دو هەڤی پێکەوە ف زندگی دوهوو با هم.
**هەڤیەك:** بەرانبەر، لە یەك پلەدا ف مساوی.
**هەق:** ۱) ڕەوا؛ ۲) کرێ، مز: (بە **هەق** کار دەکەم، دەس‌**هەق** چەندە)؛ ۳) بەش: ۴) ڕاست‌و دوروست: (گۆتنا وان **هەق** بو، قسەی **هەق** ڕەقە)؛ ۵) کۆڵین‌و دانەوە؛ ۶) خودا، خوا ف ۱) روا؛ ۲) مزد؛ ۳) بهره، سهم؛ ۴) راست و درست؛ ۵) حفر، کندن؛ ۶) خدا.
هەقاندن: دانەوە، کۆڵین، هەڵکەندن: (لکۆرتێ **دهەقینە**) ف کندن، حفر کردن.
**هەقانەت:** ڕاستی‌و ڕەوایی ف راستی و دادگری، حقّانیّت.
**هەقانی:** عادڵ، سەرڕاست ف حقّانی.
هەقانیەت: هەقانەت، ڕاستی‌و ڕەوایی ف حقّانیّت، راستی و عدالت.
**هەقایەت:** چیرۆك، حیکایەت ف داستان.
هەقبە: هەگبە ف خورجین.
هەقتـە: ۱) بۆت‌ڕەوایە؛ ۲) ڕاست‌دەکەی ف ۱) برتو رواست؛ ۲) حق داری، راست می گویی.
**هەق کەنا:** بەشقی‌خودا ف بەخاطر خدا.
هەقلەمانی: کەڵەمستێن، پشکیلان ف نوعی بازی.
**هەقلیمەقۆ:** ۱) کەڵەمستێن؛ ۲) هەراهەرا، زەنازەنا؛ ۳) حیندرحۆ ف ۱) نوعی بازی؛ ۲) هنگامه و جنجال؛ ۳) آلاکُلنگ.
**هەقمە:** ۱) بۆمن‌ڕەوایە؛ ۲) ڕاست‌دەکەم ف ۱) برمن رواست؛ ۲) حق دارم، درست می گویم.
**هەقمەق:** نەزان، نەفام، بێ‌ئاوەز، ئەحمەق ف احمق.
**هەقۆ:** خوایە، لەدوعادا ئێژن ف خدایا.
**هەقـوو:** ۱) کرێتـان، مزتـان؛ ۲) بەشتـان؛ ۳) بەئێوەڕەوا: (**هـەقووهەیە، هەقوونیە**) ف ۱) مزدتان؛ ۲) بهره‌تان؛ ۳) حق شما.
**هەقوە:** بۆتان ڕەوایە: (**هەقوەباسی‌بکەن**) ف حق دارید.
**هەقوەستێن:** ۱) کاری باش‌و ڕاست: (کاری تۆ **هەقوەستێن** بو)؛ ۲) تۆڵەسێن ف ۱) کار درست و روا؛ ۲) انتقام‌گیر.
**هەقە:** ۱) ڕاستە، ڕەوایە؛ ۲) کاکەیی؛ ۳) مریدانی شێخی شەدەڵە؛ ۴) فیڵ، گزی ف ۱) حقّ اسـت؛ ۲) اهـل حق؛ ۳) مریدان شیخی درکردستان؛ ۴) دوز و کلك، حقّه.
**هەقەباز:** فێڵباز، دەسبڕ ف حقّه‌باز.
**هەقیف:** هەگبـە، خورجی چکـۆڵـە کە لە پشت سوارەوە لەسەر پشتی یەکسم داندراوە ف خورجین ترك سوار.
**هەقیقـە:** کاوڕ یان شەکێ کە بەهـۆی حەوتمی هاتنەدنیای زاڕۆ سەری دەبڕن ف حیوانی که در هفتمین روز تولّد نوزاد قربانی شود، عقیقه.
**هەقیقەت:** ڕاستی، پێچەوانەی درۆ: (**هەقیقەتەکەی** دەڵێم) ف حقیقت.
**هەقێ قەدی:** خەڵاتی سەرباڵە لە بەرانبەر کارێ کە کردویە ف انعام سردستهٔ دروگران.
**هەك:** ۱) وشەی سەیرمان، حەك، یەك؛ ۲) وتەی سەرکۆنە، دەك؛ ۳) وتەی نفـرە؛ ۴) ئەگەر؛ ۵) بڵقی سەرئـاو ف ۱) کلمهٔ تعجّب؛ ۲) پیشـوند سرزنش؛ ۳) پیشوند نفرین؛ ۴) اگر؛ ۵) حباب روی آب.
**هەکـاری:** مەڵبەندێکی بەرفرەوانە لە کوردستانی‌بەردەستی ترکان کە زۆر پیاوی گەورەی لێ هەڵکەوتوون وەك **عیساهەکاری** کە زانایەکی بەنـاوبـانگ‌و هەمەکارەی **سوڵتان‌سەلاحەدین** بوە یان **شەرەفەدین هەکـاری**‌و زۆری‌تریش ف منـطقه‌ای وسیع در کردستان که بزرگان بسیار از آن برخاسته‌اند.

**هه‌كانی:** وشه‌ی مه‌رج‌و شه‌رت ف صیغهٔ شرطی.
**هه‌ككو:** په‌ككو ف كلمهٔ تعجّب.
**هه‌كو:** ۱) په‌كو؛ ۲) ئه‌گه‌ر، هاتو ف ۱) حرف تعجّب؛ ۲) اگر.
**هه‌كۆكه:** كوێره‌كانی كه پاش به‌هار وشك ده‌كا ف چشمهٔ آب فصلی.
**هه‌كه:** ۱) ئه‌گه‌ر؛ ۲) ئاڵۆش، خوروی له‌ش له‌تاوی گان؛ ۳) نێره‌كه‌و؛ ۴) باڵنده‌ی ماڵی، باڵداری كه‌وی ف ۱) اگر؛ ۲) خارش تن از شدّت شهوت؛ ۳) كبك نر؛ ۴) ماكیان.
**هه‌كه‌دار:** حه‌كه‌دار، به‌ئاڵۆش ف زن جلف.
**هه‌كینی:** هه‌كانی ف صیغهٔ شرطی.
**هه‌كینێ:** ئه‌گه‌ركو ف اگر كه.
**هه‌گ:** هه‌ك ف نگا: هه‌ك.
**هه‌گبـــه:** خورجێنی دوتـایی چكـۆڵـه كه له‌پشت سواره‌وه له‌زین قایم ده‌كرێ، هه‌قبه ف خورجین پشت زین.
هه‌گه‌ر: ئه‌گه‌ر ف اگر.
**هه‌ل:** ۱) ده‌رفه‌ت؛ ۲) جار، چه‌ل؛ ۳) نۆره: (لاچۆ هه‌لی منه)؛ ۴) هل، وتـه‌یه‌كـه بڵندی ده‌گه‌یه‌نێ؛ ۵) فریشته‌ی ئاگاداری لێره‌وار، خێوی جه‌نگه‌ڵ‌و دارستان؛ ۶) زانینی وشه‌و مه‌سه‌له‌ی دژوار، هه‌ڵێنانی پرسی گران؛ ۷) ره‌نگ‌بۆڵ؛ ۸) ده‌م، كات؛ ۹) ده‌می نیمه‌رۆ ف ۱) فرصت: ۲) بار، دفعه؛ ۳) نوبت؛ ۴) علامت بلندی؛ ۵) فرشتهٔ نگهبان جنگل؛ ۶) حلّ معمّا؛ ۷) توسی رنگ؛ ۸) دم، وقت؛ ۹) هنگام نیمروز.
**هه‌ڵ:** ۱) پێشگـــرێكـه زوربـه‌ی زۆربڵنـدی‌و لای‌سه‌رۆ ده‌گه‌یه‌نێ؛ ۲) پێشگـری به‌واتـا: به‌توندی، به‌قه‌وه‌ت: (هه‌ڵی درِی، هه‌ڵدره، هه‌ڵی پێچا)؛ ۳) ئاغه‌ڵ، هۆڵه‌مه‌ڕ؛ ۴) پێ‌بوٌن، داگیرسانی ئاگر: (ئاگر **هه‌ڵ** بوٌ)؛ ۵) پێچـانی داو له شتێ: (ئه‌م‌به‌نه‌م بۆ **هه‌ڵكه**)؛ ۶) جیابوٌنه‌وه‌ی پارچـه له شتێ: (تـه‌ڵه‌زمێك، له‌به‌رد **هه‌ڵ** بو)؛ ۷) گوزه‌ران، رابواردن: (ده‌گه‌ڵی هه‌ڵكه، **هه‌ڵ** ناكه‌م) ف ۱) پیشوند به معنی بلندی، بالا، بر؛ ۲) پیشوند به معنی شدّت و تندی؛ ۳) آغل؛ ۴) اشتعال، افروختن؛ ۵) پیچیدن نخ به دور چیزی؛ ۶) جداشدن قطعه‌ای از چیزی؛ ۷) گذران، زندگی، سركردن.
**هه‌لا:** ۱) هه‌را، ده‌نگی به‌قه‌و؛ ۲) رزیو، پڵیخاو: (**هه‌لاهه‌لا** بوه)؛ ۳) لا، كه‌نـــار؛ ۴) وه‌ره، بانـگ‌كردن بۆ هاتن ف ۱) داد، صدای بلنـد؛ ۲) پوسیده؛ ۳) كنار؛ ۴) بیا.
**هه‌ڵا:** ۱) هه‌راو چه‌قـه، زه‌نـازه‌نـا؛ ۲) كێشـه‌و شه‌ڕ؛ ۳) دنیای بێ‌خۆر: (هه‌ورو **هه‌ڵایه**)؛ ۴) ئامۆر، هه‌وجار ف ۱) همهمه و جنجال؛ ۲) نزاع و جنگ؛ ۳) هوای تاریك و بدون آفتاب؛ ۴) خیش.
**هه‌ڵ ئاخنین:** تا سه‌ر ئاخنینه‌وه ف تالبه آكندن.
**هه‌ڵ ئاوه‌سین:** به‌ره‌وژۆر داله‌قاندن ف به‌بالا آویزان كردن.
**هه‌لاب:** هلاب، مانگی پڕ، مانگی شه‌وی چارده ف بدر.
**هه‌لابـاجی:** گه‌مه‌یه‌كی زاروكانه تلی شاده‌ی ده‌ستی ڕاست له‌ناو له‌پی ده‌ستی چه‌پا ئه‌سوڕێنن ڕه‌سمی شتێك به‌خه‌یاڵ ده‌كه‌ن كه ئه‌یانه‌وێ ف نوعی بازی كودكان شبیه لی لی حوضك.
**هه‌ڵابردن:** هێرش بردنه‌سه‌ر ف هجوم بردن.
**هه‌لات:** ۱) درۆی زل: (ئه‌م‌قسه هه‌ر درۆنیه هه‌لاته)؛ ۲) خۆهه‌ڵكێشان؛ ۳) رای كرد ف ۱) دروغ شاخدار؛ ۲) لاف، خودستایی؛ ۳) فراركرد.
**هه‌ڵات:** ۱) رای‌كرد؛ ۲) له‌ئاسۆ دیاری‌دا، هاته به‌رچاو. بۆ مانگ‌وخۆرو ئه‌ستێره‌ی ده‌ڵێن؛ ۳) نێر له مێو سواربـــو، په‌ڕی: (ئـــه‌سپـــه‌كـــه دوجـارلـه‌ماینه‌كه **هه‌ڵات**)؛ ۴) كاتی هه‌ڵاتنی مانگ‌و خۆر: (مانگ **هه‌ڵات**هاتم، تاو **هه‌ڵات** گه‌یمـــه به‌رێ)؛ ۵) هه‌ڤیر پێ‌گه‌یشت؛ ۶) ته‌واوبو، بڕایه‌وه: (هه‌رگا عیدده‌ت **هه‌ڵات** ده‌توانی مێردبكه‌ی) ف ۱) فرار كرد؛ ۲) طلوع كرد؛ ۳) گشن بر مادینه سوار شد؛ ۴) دم طلوع؛ ۵) خمیر برآمد؛ ۶) مدّت سرآمد.
**هه‌ڵاتگ:** وشه‌ی به‌ركاری بۆ هه‌ڵات ف صیغهٔ مفعولی «هه‌ڵات».
**هه‌ڵاتن:** چاوگه‌ی وشه‌ی **هه‌ڵات** ۱) راكردن؛ ۲) له ئاسۆ وه‌ده‌ركه‌وتنی مانـــگ‌و خۆرو ئه‌ستێره؛ ۳) په‌ڕینی نێر له مێوینـه؛ ۴) پێ‌گه‌یشتنی هه‌ویر؛ ۵) ته‌واوبـــوٌن، به‌ســـه‌رچـوٌن، بڕانـه‌وه؛ ۶) خۆ له ناو ئاودا قوم‌كردن‌و هاتنه‌وه‌ده‌ر: (به‌یانی زوٌ ده‌حه‌وزێ **هه‌ڵاتم**) ف **مصدر كلمهٔ «هـه‌ڵات»** ۱) فراركـردن؛ ۲) طلوع كردن؛ ۳) سوارشـدن گشن بر مادینه؛ ۴) برآمدن خمیر؛ ۵) سرآمدن مدّت؛ ۶) درآب غوطه‌ورشدن.
**هه‌ڵاتو:** هه‌ڵاتگ ف نگا: هه‌ڵاتگ.
**هه‌ڵاته:** هه‌ڤیری هه‌ڵاتگ ف خمیر برآمده.
**هه‌ڵات‌هه‌ڵات:** راكـــردن به‌گشـتی، هه‌ڵاتنی هه‌مـــوكـــه‌س له كاتی مه‌ترسی‌دا ف فرار عمومی هنگام خطر.
**هه‌لاج:** ۱) كه‌سێ كه به كوتك‌و كه‌وان كوڵكه‌و خوری شی ده‌كاته‌وه؛ ۲) راژان به‌حـه‌واوه، هاتوچۆ به داله‌قاوی ف ۱) پنبه‌زن؛ ۲) جنبش در هوا، نوسان.
**هه‌لاجان:** راژان به‌حه‌واوه ف نَوسان.
**هه‌لاجاندن:** راژاندن به‌حه‌واوه ف نوسان دادن، لر زاندن در هوا.
**هه‌لاجی:** كاری كوڵكه‌شی‌كردنه‌وه ف پنبه‌زنی، ندّافی.
**هه‌لاجین:** هه‌لاجان ف نَوسان.
**هه‌ڵاچوٌن:** له بڵندی چوٌنه‌سه‌ر ف صعود.
**هه‌ڵاخن:** هه‌ڵ‌ئاخن، تا سه‌ر به‌توندی ئاخنینه‌وه ف آكندن تا لبه با فشار.
**هه‌ڵاخناو:** ئاخندراو تا لێوان به پته‌وی ف آكنده با فشار تا لبه.
**هه‌ڵاخندراو:** هه‌ڵاخناو ف آكنده با فشار تا لبه.
**هه‌ڵاخنراو:** هه‌ڵاخناو ف نگا: هه‌ڵاخناو.
**هه‌ڵاخنیاگ:** هه‌ڵاخناو ف نگا: هه‌ڵاخناو.
**هه‌ڵاخنین:** ئاخنینه‌وه تا لێوان به‌توندی، هه‌ڵ‌ئاخنین ف آكندن تا لبه با فشار.
**هه‌لار:** ۱) هه‌لا، له‌بـــه‌ریه‌ك‌چوی ڕزاو؛ ۲) تینـــی ئاگر، هالاو ف ۱) پوسیده؛ ۲) گرمای آتش.
**هه‌ڵازران:** خوێن‌تێ‌تزان ف خون مُردگی.
**هه‌ڵازناو:** ۱) هه‌ڵاخناو؛ ۲) گش لای پێست وه‌به‌رهاتو: (پێستی له‌زیبكه هه‌ڵازناوه) ف ۱) نگا: هه‌ڵاخناو؛ ۲) فراگرفتگی تمام پوست از عارضه‌ای.
**هه‌ڵازندراو:** هه‌ڵازناو ف نگا: هه‌ڵازناو.

**هەڵازنین:** ۱) هەڵاخنین؛ ۲) گش لای پێست وەبەرهاتن؛ ۳) خەونوچکە بردنەوە ف ۱) نگا: هەلاخنین؛ ۲) همهٔ پوست را جوش یا کهیر فراگرفتن؛ ۳) چرت زدن.

**هەڵاژیان:** خۆدرێژکردن لەسەر لا بۆ خەوتن، راکشان ف بر پهلو دراز کشیدن.

**هەڵاژیاو:** راکشاو ف دراز کشیده.

**هەڵاژین:** هەڵاژیان ف درازکشیدن.

**هەڵاژیو:** هەڵاژیاو ف دراز کشیده.

**هەڵاش:** ئالاش. هالاش. هەراش ف انبیره.

**هەلاشانی:** پاش نیمەڕۆ ف بعدازظهر.

**هەڵافە:** چەکەرەی گیا ف نیش گیاه.

**هەڵاڤی:** گیایەکە بۆ ماڵات ژەهرە ف گیاهی است برای دام سمّی است.

**هەلاڤیت:** بەرەوباڵای ئاویشت ف برانداخت، بەبالا انداخت.

**هەلاڤیتن:** بەرەوژوور ئاویتن ف برانداختن، روبه بالا انداختن.

**هەلاڤیتی:** بەرەوژوور ئاویژراو ف بەبالا انداخته شده.

**هەلاك:** ۱) ماندوو؛ ۲) نەخۆشی زۆر حاڵخراب، لە بێهۆشی و ئاویلکەداندا؛ ۳) مردن، مەرگ ف ۱) خسته؛ ۲) بیمار محتضر؛ ۳) مرگ.

**هەلاکان:** خنەخن، پشوسواربوون لەبەر ماندوویی ف بە هِن‌هِن افتادن.

**هەلاکەوتن:** وەلاکەوتن، چوونەکەنار ف کنار رفتن.

**هەلال:** ۱) گوڵی سمڵ؛ ۲) پیفۆك، کیفۆك ف ۱) نوعی گل، نام گلی است؛ ۲) نگا: کیفۆك.

**هەڵاڵ:** ۱) ڕەوا، حەڵاڵ؛ ۲) دەرمانی چەرمخۆش کردن؛ ۳) گوڵێکی زەردی بەهۆشی زۆر بۆنخۆشە: (لەکن وەنەشەو خاوو **هەڵاڵ** و بەیبوونی/ **هەڵاڵی** پێستەیی خاوە عەبیرو مێشکی خەتا) «حاجی قادر»؛ ۴) برێتی لە ژنی ڕەواو شەرعی: (**هەڵاڵ** خۆمە) ف ۱) روا، حلال؛ ۲) داروی دبّاغی؛ ۳) گلی است خوشه‌ای زردرنگ و بسیار خوشبو؛ ۴) کنایه از همسر.

**هەلال بۆ:** ئافەرم، حەڵاڵتە ف آفرین، حلالت باد.

**هەڵاڵخانە:** دەباغخانە، ئەوشوێنەی چەرمی لێ خۆش دەکەن ف دبّاغ خانه.

**هەڵاڵدان:** خۆش کردنی چەرم بە دەرمان ف دبّاغی کردن.

**هەلال‌زادە:** ۱) کوڕی نەبیژو؛ ۲) برێتی لە مرۆی زۆر بەپیاوەتی و دەمارو ڕاستگۆ ف ۱) حلال‌زاده؛ ۲) کنایه از آدم جوانمرد و درستکار.

**هەلالك:** بەلاڵۆکەکێویلکە ف آلبالوی کوهی.

**هەلالوك:** بەلاڵوکە کێویلکە ف آلبالوی کوهی.

**هەڵاڵە:** ۱) گوڵی زەردی بۆنخۆشی بەناوبانگ، هەڵاڵ؛ ۲) دەرمانی پێستەخۆش کردن؛ ۳) ماکی مۆم کە میشەنگوین لە گوڵانی دەگرێ؛ ۴) تۆزی ڕوەکی نێر بۆ ئاوس بوونی ڕوەکی مێوینە؛ ۵) جاڕ، بەقەو هەراکردن؛ ۶) مێلاقە، ڕەبەنۆك؛ ۷) ناوی ژنانە ف ۱) گلی است زرد و خوشبوی، نگا: هەلاڵ؛ ۲) داروی دبّاغی؛ ۳) مادّهٔ موم که زنبور از گلها می گیرد؛ ۴) مادّهٔ لقاح نباتات، گردهٔ گلها؛ ۵) آواز در دادن، جار؛ ۶) آلاله؛ ۷) نام زنانه.

**هەڵاڵەبرمە:** گوڵێکی سووری زلە، شلێرە ف لالهٔ واژگون.

**هەڵاڵەکشکش:** جۆرێ سەماو ڕەخس، چۆپی ف نوعی رقص.

**هەلالەی‌سەرو:** حەڵاڵی شەرعی ف حلال شرعی.

**هەلالەی‌واشتش:** حەلاڵ‌کردن ف حلال کردن.

**هەلالی‌یە:** حەڵاڵ‌کردن ف حلال کردن.

**هەڵامات:** ۱) نیشانە، عەلامەت؛ ۲) ئالامەت، پەسیو ف ۱) علامت؛ ۲) زکام.

**هەڵاماسین:** فرە ئەستووربوون ف زیاد آماسیدن.

**هەڵامساو:** فرە ئەستووربووگ، زۆر پەنەماگ ف زیاد آماسیده.

**هەڵامسین:** هەڵاماسین ف زیاد آماسیدن.

**هەڵامسیو:** هەڵامساو ف زیاد آماسیده.

**هەلامە:** گیادۆکلێویکە لە چێشتانی دەکەن ف گیاهی است آشی.

**هەڵامەت:** هەڵامات، ئارسم، پەسیف ف زکام.

**هەڵامەت‌دار:** ۱) نیشانەلێدراو؛ ۲) کەسێ کە پەسیوی بێت ف ۱) نشان شده، آرم زده؛ ۲) زکامی، مبتلا به زکام.

**هەلان:** ۱) گوڕە، نەعرەتە؛ ۲) بەردی لووس و ڕێك کە لەجیاتی موزاییك لە تەختی وەتاغ فەرش دەکرا، پختۆك، خام ف ۱) نعره؛ ۲) سنگ صاف ویژهٔ سنگفرش.

**هەلاندن:** ۱) تواندنەوە؛ ۲) بڵندکردن، هلاندن ف ۱) گداختن؛ ۲) بلندکردن.

**هەلاندی:** تاواوە ف گداخته.

**هەلانین:** ۱) هەڵگرتن؛ ۲) شاردنەوە؛ ۳) بردن: (دژمن هەموو مادەنێ مە **هەلانین و برن**)؛ ۴) بڵندکردن؛ ۵) لابردن ف ۱) برداشتن؛ ۲) پنهان کردن؛ ۳) بُردن؛ ۴) بلندکردن؛ ۵) بەکنار بردن، جابجا کردن.

**هەلاو:** ۱) شیرنی، شیرنایی، شیرانی؛ ۲) ناوی ژنان؛ ۳) پەرسڤی تەلەیفون؛ ۴) گیایەکی دەشتی‌یە؛ ۵) تینی گەرما بە بۆخەوە، هالاو؛ ۶) هەڵوا؛ ۷) دۆشاو ف ۱) شیرینی؛ ۲) نام زنانه؛ ۳) جواب تلفن، الو؛ ۴) گیاهی است صحرایی؛ ۵) گرمای همراه با بخار؛ ۶) حلوا؛ ۷) شیرهٔ انگور.

**هەڵاو:** هالاو، بۆخ لە گەرماو ئاوی گەرمەوە ف بخار و گرما.

**هەلاواربی:** ۱) هەڵوای ئاردو دۆشاو؛ ۲) هەڵوای ئاردو شەکراو ف ۱) حلوای آرد و شیره؛ ۲) حلوای آرد وشکر.

**هەڵاواردن:** لێك جیاکردنەوە، هاوێر ف ازهم جداکردن.

**هەڵاواستن:** دالەقاندن ف آویختن.

**هەڵاواسین:** هەڵاواستن ف آویختن.

**هەلاواۆشك:** وشکەڵوا ف حلوای خشك.

**هەڵاوردن:** ۱) هاوردنەوەی خۆراك، ڕشانەوە؛ ۲) خا کردنەجوچکە: (مامرەکە جوچکەی **هەڵاورد**)؛ ۳) زانینی مەتەڵۆکە؛ ۴) سنەدان لێهاتنی ماڵات ف ۱) بالاآوردن طعام، قی؛ ۲) تخم را جوجه‌کردن؛ ۳) حلّ کردن معمّا؛ ۴) نوعی بیماری کشندهٔ دام.

**هەڵاوردە:** سندانی نەخۆشی ماڵات ف نوعی بیماری کشندهٔ دام.

**هەڵاوسان:** ۱) فرەئاوسان؛ ۲) دالەقان ف ۱) زیاد آماسیدن؛ ۲) آویزان شدن.

**هەڵاوساو:** فریەپەنەماگ ف بسیار آماسیده.

**هەلاون:** شیرن وەك هەڵوا ف شیرین مانند حلوا.

**هەلاوە:** گیایەکە دەخورێ ف گیاهی است خوراکی.

**هەڵاوە:** جاو، جانگ ف کرباس.

**هەڵاوەستن:** هەڵاواسین ف آویزان کردن.

**هەڵاوەسراو:** دالەقای ف آویخته.

**هەڵاوەسین:** هەڵاواسین، هەڵاوەستن ف آویزان کردن.

**هەڵاوەگێڕ:** ژێروژوکراو ف برگردانده، زیرورو شده.

**هەلاوەمەلاوە:** وتەی منالان لەسەر کولانەی ماڵان ئێوارەی نەوروز بۆ جێژنانە: (**هەلاوەمەلاوە** خودا کوڕەکەتان بکا بەزاوا) ف اصطلاحی است که کودکان شب عید نوروز بر روی بامها برای دریافت عیدی به کار می‌برند.

**هەلاوی:** هەڵوای ئاردو دۆشاو ف حلوای آرد وشیره.

**هەڵاوێ:** بەرەوژوور فڕێدە ف به بالا پرت کن.

**هەڵاویتن:** فڕێدان بەرەوژوور ف به بالا پرت کردن.

**هەڵاوێر:** لێك جیاکەرەوە ف ازهم سوا کننده.

**هەڵاوێران:** هەڵاواردن ف ازهم جداکردن.

**هەڵاوێز:** هەڵاوەسراو ف آویخته.

**هەڵاوێژ:** بەرەوژوور فڕێدەر ف بەبالا پرت کننده.

**هەڵاویژتن:** هەڵاویتن ف بەبالا پرت کردن.

**هەڵاوێژە:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**هەڵاویستن:** هەڵاوەسین ف برآویختن.

**هەڵاویشتن:** هەڵاویتن ف بەبالا پرت کردن.

**هەلاهەل:** شیلەی گیایەکە زۆر کوشنەیە ف هلاهل.

**هەلاهەلا:** ۱) شەقارشەقار؛ ۲) هەراو هوریا، هەللاهەللا؛ ۳) تۆ بڕوانە، ئای چەندسەیرە! ف ۱) لە و ازهم پاشیده؛ ۲) سروصدا و جنجال؛ ۳) علامت تعجّب.

**هەلاهیل:** هەلاهەل ف هلاهل.

**هەلای:** سەما، رەخس ف رقص.

**هەڵایسـان:** ۱) ئاگرگرتن، گڕتێبەربـوون، پێبوون؛ ۲) بریتی لە شەڕو هەرا قەومان ف ۱) برافروخته‌شدن؛ ۲) کنایه از آشوب بپاشدن.

**هەڵایسـاندن:** ۱) گڕ بەرزکردنی ئاگر؛ ۲) بریتی لە کێشەنانەوە ف ۱) برافروختن؛ ۲) کنایه از آشوب بپاشدن.

**هەڵایسـێن:** ۱) ئاگرپـێکەر؛ ۲) بریتی لە هۆی کێشـەو هەرا ف ۱) افروزنده؛ ۲) کنایه از مایهٔ شرّ و فتنه.

**هەلایل:** هەلاهیل ف هلاهل.

**هەلایەری:** پاش نیوەڕۆ ف بعدازظهر.

**هەلبا:** هەڵوا ف حلوا.

**هەلپاسك:** ئاوقا، بەرەنگار ف گلاویز.

**هەڵبچـڕین:** لەسەر فڕێدان: (ئەم سەرەقوتوە **هەڵبچڕە**، مشەما لە برین **هەڵبچڕە**) ف بر کندن.

**هەڵبڕ:** ۱) بڕدراو بەتیخ؛ ۲) کەسێ کە شتێ بڵنددەکا: (ئەو بەردە **هەڵبڕە** بزانە چی لەژێردایە)؛ ۳) دواکەوتن بەغار ف ۱) لت و بارشده با تیغ؛ ۲) بلند کننده؛ ۳) تعقیب در حال دو.

**هەڵبـڕان:** ۱) بڕان بە تیغ؛ ۲) جوێبوونـەوە: (کاکم لە ئێمە **هەڵبڕا**)؛ ۳) بڵنـدکـران ف ۱) بریده شدن با تیغ؛ ۲) جداشدن؛ ۳) بلندشدن به وسیلهٔ دیگری.

**هەڵبڕاندن:** ۱) بڵندکردن؛ ۲) بڕین بە تیغ؛ ۳) کەتنەشوێن بەغار ف ۱) بلند کردن؛ ۲) بریدن با تیغ؛ ۳) در تعقیب دویدن.

**هەڵبڕانن:** هەڵبڕاندن ف نگا: هەڵبڕاندن.

**هەڵبـڕاو:** ۱) بڕدراو بە تیغ؛ ۲) راکـردو لەتـرسـان؛ ۳) جیاوەبوگ؛ ۴) بڵندکراو: (چرا **هەڵبڕە** سـەی دز دیارە) ف ۱) بریده شده با تیغ؛ ۲) فراری شده از ترس؛ ۳) جداشده؛ ۴) بلندشده.

**هەڵ بڕزکان:** ۱) رەنگ‌بزرکان؛ ۲) خەراوبوونی شیر ف ۱) رنگ باختن؛ ۲) فاسدشدن شیر.

**هەڵ برزکین:** هەڵ بڕزکان ف نگا: هەڵ بڕزکان.

**هەڵ برژان:** ۱) پیش‌هەڵاتن لەگەرمان؛ ۲) برژانەوەو سوزانەوەی برین؛ ۳) هەتـوان لەسەردانان‌و برژاندنەوەی برین ف ۱) از گرما به ستوه آمـدن؛ ۲) سوزش در پوست احسـاس کردن؛ ۳) خون بندآوردن و مرهم بر زخم گذاشتن.

**هەڵ برژیان:** هەڵ برژان ف نگا: هەڵ برژان.

**هەڵ بڕسقان:** رفان، فڕان ف ربایش، ربوده شدن.

**هەڵ بڕسقانن:** رفاندن، فڕاندن ف ربودن.

**هەڵ بڕسکان:** هەڵ بڕزکان ف نگا: هەڵ بڕزکان.

**هەڵ برنگان:** وەستانی باران ف بندآمدن باران.

**هەڵ برنگاندن:** هەڵ برنگان ف بند امدن باران.

**هەڵ برنگانن:** هەڵ برنگان ف بندآمدن باران.

**هەڵبـڕهـەڵبڕ:** ۱) لەت‌لەت‌کران بە تیغ؛ ۲) پارچەپارچەکردنی کۆمەڵی زیندو: (گورگ وەناو مەڕ کەوت **هەڵبڕهەڵبڕی** تێخستن) ف ۱) با تیغ پاره‌پاره شده؛ ۲) جداجدا از هم.

**هەڵبڕیان:** هەڵبڕان ف نگا: هەڵبڕان.

**هەڵبـڕین:** ۱) بڵنـدکردن؛ ۲) کەوتنەشوین یەکێ بەغار: (**هەڵمبڕی** تا دەماڵێم‌کردەوە)؛ ۳) بە تیخ لەت‌کردنی گوریس‌وڕیس؛ ۴) گۆڕینی ڕێگـەی ئاو: (ئـاوەکـەی **هەڵبـڕی** بۆ نێو جۆیەکـەی خۆی) ف ۱) بلندکردن؛ ۲) تعقیب در حال دویدن؛ ۳) بریدن با تیغ؛ ۴) تغییردادن مسیر آب.

**هەڵ برینگان:** هەڵ برنگان ف نگا: هەڵ برنگان، بندآمدن باران.

**هەڵ برینگاندن:** هەڵ برنگان ف بندآمدن باران.

**هەڵ برینگانن:** هەڵ برنگان ف بندآمدن باران.

**هەڵ بزڕکان:** هەڵ بڕزکان ف نگا: هەڵ بڕزکان.

**هەڵبزرکاو:** ۱) رەنگ‌بزرکاو؛ ۲) شیری خراوبوگ ف ۱) رنگ باخته؛ ۲) شیر فاسدشده.

**هەڵبزرکین:** هەڵبزرکان ف نگا: هەڵبزرکان.

**هەڵبزوق:** بەرزەوەبـوُن‌و داکەوتن بەپەلەپەل‌و نزیك بە زەوی: (ماسی لەسەر وشکانی **هەڵدەبزوقێ**) ف جست و خیز سریع و پی‌درپی.

**هەڵبزوقین:** بەرزەوەبوُن‌و داکەوتنی لەدوای یەك‌و بەپەلە، هەڵبزوق ف جست و خیز کردن سریع و متوالی.

**هەڵبزوقینەوە:** هەڵبزوقین ف نگا: هەڵبزوقین.

**هەڵبژارتن:** نەقاندن ف انتخاب کردن، برگزیدن.

**هەڵبژارتو:** نەقاندی ف برگزیده.

**هەڵبژارتە:** هەڵبژارتو ف برگزیده.

**هەڵبژارتی:** هەڵبژارتو ف برگزیده.

**هەڵبژاردن:** هەڵبژارتن ف برگزیدن.

**هەڵبژاردو:** هەڵبژارتو ف برگزیده.

**هەڵبژاردە:** هەڵبژارتو ف برگزیده.

**هەڵبژانن:** هەڵبژارتن ف برگزیدن.

**هەڵبژراو:** هەڵبژارتو ف برگزیده.

**هەڵبژنیاگ:** هەڵبژارتو ف برگزیده.

**هەڵبژنین:** هەڵبژارتن ف برگزیدن.

**هەڵبژیاگ:** هەڵبژاردە، هەڵبژارتە ف برگزیده.

**هەڵبژێر:** کەسێ کە هەڵدەبژێرێ ف انتخاب کننده.

**هەڵبژێراو:** هەڵبژارتو ف برگزیده.

**هەڵبژێردراو:** هەڵبژارتو ف برگزیده.

**هەڵبژین:** هەڵبژارتن ف برگزیدن.

**هەڵبژێن:** هەڵبژێر ف برگزیننده، انتخاب کننده.

**هەڵبسم:** ئەڵبسم، ئاوریشم، هەورەمیش ف ابریشم.

**هەڵبشکوڕین:** گەش‌و ڕوخۆش بوُن ف شاد و سرحال بودن.

**هەڵبگـاردن:** ۱) بوداردن، خۆ لێ‌لادان؛ ۲) داو دەنیوڕاکـردن ف ۱) گذشتن از، مورد توجّه قرار ندادن؛ ۲) تار و نخ از چیزی گذراندن.

**هەڵبگێڕاندن:** هەڵبگاردن ف نگا: هەڵبگاردن.

**هەڵبگێڕانن:** هەڵبگاردن ف نگا: هەڵبگاردن.

**هەڵبلوق:** هەڵبزوق ف نگا: هەڵبزوق.

**هەڵبلوقان:** هەڵبزوقین ف نگا: هەڵبزوقین.

**هەڵبلوقاو:** کەوتوسە هەڵبزوقین ف بەجست و خیز و تپش افتاده.

**هەڵبلوقین:** هەڵبزوقین ف نگا: هەڵبزوقین.

**هەڵبلوقینەوە:** هەڵبزوقین ف نگا: هەڵبزوقین.

**هەلبلە:** بنەگیایەکە بۆ دەرمان دەشێ ف ریشه‌ای دارویی.

**هەڵبواردن:** هەڵبگاردن ف نگا: هەڵبگاردن.

**هەڵبورونگان:** هەڵبرنگان ف بندآمدن باران.

**هەڵبوُن:** ۱) لە بەرەژوُر بوُن؛ ۲) پێ‌بوُنی ئاگر؛ ۳) جیابوُنەوەی تەڵەزم لە شتێ: (بـە کوتـك لەوبەردەمدا کەمێکی لێ **هەڵبو**، دڵۆ لە دەستم **هەڵبو**) ف ۱) در بالا قرارگرفتن؛ ۲) روشن شدن آتش، افروختن؛ ۳) جداشدن قطعه‌ای از چیزی.

**هەڵبۆی:** بۆنی پەڕوی سوُتاو، بۆسۆ ف بوی پنبه یا پارچهٔ سوخته.

**هەڵبە:** پێ‌بە، مەکوژێوە: (**هەڵبە ئاگری، هەڵبە ئاگری**) ف برافروز.

**هەڵبەت:** ۱) بێ‌گومان، بێ‌سۆ؛ ۲) وێ‌دەچێ، رەنگە: (**هەڵبەت لە ماڵی ئێمەیە**) ف ۱) البتّه؛ ۲) انگار، لابد.

**هەڵبەتە:** هەڵبەت ف نگا: هەڵبەت.

**هەڵبەز:** خۆ حەوادان بەرەوژوُر ف خیزبردن.

**هەڵبەزان:** هەڵبەز ف خیزبردن، پریدن.

**هەڵبەزاندن:** بەرەوژوُر جوڵاندنەوە ف جهانیدن.

**هەڵبەزاندنەوە:** هەڵبەزاندن ف جهانیدن.

**هەڵبەزاننەوە:** هەڵبەزاندن ف جهانیدن.

**هەڵبـەزدابـەز:** بەرەژوُر خۆ حەوادان‌و هاتنـەخوار ف جستن و پایین آمدن، جست وخیز.

**هەڵبەزە:** بەرەژوُر خۆ حەوادە ف جهش کن.

**هەڵبەزین:** هەڵبەزان ف برجستن، جهیدن.

**هەڵبەزینـەوە:** وەزەوی کەوتن‌و بڵنـدبـوُنـەوە: (بـەردە کە **هەڵبەزیەوە** وەمن کەوت) ف بر زمین افتادن و باز برجستن.

**هەڵبەس:** ۱) کەسێ شکستە دەبەسێتەوە، شکستەبەند؛ ۲) کەسێ ڕیشو بادەدا؛ ۳) قسـەی سەربـەخـۆی بێ‌ڕاستی؛ ۴) بویژ، شاعیر ف ۱) شکستـەبند؛ ۲) تاب دهندهٔ پرزهای لباس؛ ۳) سخن ساختگی؛ ۴) شاعر، ناظم شعر.

**هەڵبەست:** هەڵبەس ف نگا: هەڵبەس.

**هەڵبەستـراو:** ۱) تونـدو قایم‌کراو؛ ۲) شکستی پێکـەوەنوسێنراو؛ ۳) بادراوی ڕیشو؛ ۴) قسەی سەربەخۆ؛ ۵) بەندی داندراو لە پێش ئاوی جوگەو چەم ف ۱) محکم شده؛ ۲) شکسته‌بندی شده؛ ۳) پرز تاب داده بر پارچه؛ ۴) سخن بی‌اساس و ساختگی؛ ۵) سدّ ایجاد شده بر نهر و رودخانه.

**هەڵبەستن:** ۱) دابـەستن، قایم کردن؛ ۲) بادانی ڕیشـو؛ ۳) شێعـر دروست کردن؛ ۴) قسەسازکردن؛ ۵) بەند دروست کردن لەبەر ئاو ف ۱) محکم و استوار کردن؛ ۲) تاب دادن پرز پارچه؛ ۳) به نظم درآوردن کلام؛ ۴) حرف درآوردن؛ ۵) سدّ بستن جلو آب.

**هەڵبەستنەوە:** شکستەبەندی شکاو کردن ف شکسته‌بندی کردن.

**هەڵبەستە:** ۱) بوختان؛ ۲) بەشێعر گوتراو ف ۱) بهتان؛ ۲) منظومهٔ شعر.

**هەڵبەسە:** هەڵبەستە ف نگا: هەڵبەستە.

**هەڵبەسیاگ:** هەڵبەستراو ف نگا: هەڵبەستراو.

**هەڵپ:** ۱) تەماح؛ ۲) بەلەو لەز ف ۱) طمع؛ ۲) شتاب.

**هەڵپاچ:** بڕین بە مقەست ف چیدن با قیچی.

**هەڵپاچان:** ۱) هەڵپاچ؛ ۲) گیایەکە بۆ دەرمانی کەچەڵی دەبێ ف ۱) با قیچی بریدن؛ ۲) گیاهی است دارویی.

**هەڵپاچراو:** قەیچی کراو ف بریده با قیچی.

**هەڵپاچین:** هەڵپاچ ف با قیچی بریدن.

**هەڵپچڕ:** ۱) لەسەر لادراو بەتەوژم: (قوتو سەری **هەڵپچڕاوە**)؛ ۲) لەبەریەكچوُنی تەقەڵ [ف] ۱) سرپوش برداشتن با فشار؛ ۲) بر دریده شدن بخیه.

**هەڵپچڕان:** هەڵپچڕ [ف] نگا: هەڵپچڕ.

**هەڵپچڕاندن:** ۱) لەسەر لاگرتنی پێوەنوُساو؛ ۲) دادڕینی تەقەڵ لێدراو [ف] ۱) برکندن درپوش؛ ۲) بردریدن بخیه.

**هەڵپچڕاو:** ۱) سەرلەسەر لاگیراو؛ ۲) دادڕاوی تەقەڵ لێدراو [ف] ۱) سرپوش برداشته شده؛ ۲) بخیەزدهٔ دریده شده.

**هەڵپچڕاوە:** جێگەی دڕاو لەجێ تەقەڵان [ف] جای بردریده.

**هەڵپچڕاوی:** هەڵپچڕاوە [ف] جای بردریده.

**هەڵپچڕكان:** پسانی گەڵاو ڵك لە روەك [ف] گسستن برگ و شاخه از گیاه.

**هەڵپچڕكاندن:** پساندنی گەڵاو ڵك [ف] گسلانیدن شاخه و برگ.

**هەڵپچڕین:** ۱) سەرلەسەر لابردن بەزۆر؛ ۲) دادڕینی تەقەڵ لێدراو [ف] ۱) سرپوش برداشتن با فشار؛ ۲) بخیەزده را بردریدن.

**هەڵپچكڕان:** هەڵپچڕان [ف] نگا: هەڵپچڕان.

**هەڵپچكڕاندن:** هەڵپچڕاندن [ف] نگا: هەڵپچڕاندن.

**هەڵپچكڕاو:** هەڵپچڕاو [ف] نگا: هەڵپچڕاو.

**هەڵپچكڕین:** هەڵپچڕین [ف] نگا: هەڵپچڕین.

**هەڵپچورکان:** هەڵپچڕكان [ف] نگا: هەڵپچڕكان.

**هەڵپچورکاندن:** هەڵپچڕكاندن [ف] نگا: هەڵپچڕكاندن.

**هەڵپرتاندن:** دەرکردن بە سوُکایەتی [ف] دك كردن با اهانت.

**هەڵپرچان:** ڕفان لەنکاو [ف] ربودن یا ربوده‌شدن ناگهانی.

**هەڵپرچانن:** رفاندنی لەنەکاو [ف] ربودن ناگهانی.

**هەڵپڕژان:** ۱) بڵندبوُنی تنوکەئاو لە عەرزەوە؛ ۲) برێتی لە خۆ دەگژڕاکردن [ف] ۱) جهش قطرات آب؛ ۲) کنایه از گلاویز شدن برای جنگ.

**هەڵپڕژاندن:** ئاو بەرەوبالا پڕژاندن [ف] آب رابه بالا پرتاب کردن.

**هەڵپڕژانن:** ئاو بەرەوبالا پڕژاندن، هەڵپڕژاندن [ف] نگا: هەڵپڕژاندن.

**هەڵپروان:** بەوردی ڕژانەخوار، پریوان [ف] ریزه‌ریزه ریختن از بالا.

**هەڵپرواندن:** بەوردی ڕژاندنەخوار، پریواندن [ف] ریز ریز از بالا ریزش دادن.

**هەڵپروانن:** هەڵپرواندن [ف] نگا: هەڵپرواندن.

**هەڵپڕوُز:** ۱) سوُتانی موُ بە ئاگر؛ ۲) برێتی لە پەلەو لەز ۱) سوختن مو با آتش؛ ۲) کنایه از عجله و شتاب.

**هەڵپڕوُزان:** سوُتانی موُ [ف] سوختن مو.

**هەڵپڕوُزاندن:** سوُتاندنی موُ [ف] سوزاندن مو.

**هەڵپڕوُزانن:** سوُتاندنی موُ [ف] سوزاندن مو.

**هەڵپڕوُزاو:** موُی بەئاگر سوُتاو [ف] موی سوخته.

**هەڵپڕوزقان:** ۱) رفان لە دەستی کەسێ لەنکاو؛ ۲) ڕەنگ‌پەڕین لەترسانو لە شتی نەکاو [ف] ۱) ناگهانی از دست کسی ربوده؛ ۲) رنگ باختن از ترس و رویداد ناگهانی.

**هەڵپڕوزقانن:** ۱) رفاندن لە دەست لەنکاو؛ ۲) بوُنەهۆی ڕەنگ‌پەڕینی کەسێ [ف] ۱) ربودن ناگهانی؛ ۲) سبب رنگ باختن کسی شدن.

**هەڵپڕوزکان:** هەڵپڕوزقان [ف] نگا: هەڵپڕوزقان.

**هەڵپڕوزکاندن:** هەڵپڕوزقانن [ف] نگا: هەڵپڕوزقانن.

**هەڵپڕوزکانن:** هەڵپڕوزقانن [ف] نگا: هەڵپڕوزقانن.

**هەڵپڕوزکین:** هەڵپڕوزقان [ف] نگا: هەڵپڕوزقان.

**هەڵپڕوزیاگ:** موُی سوُزیاو [ف] موی سوخته.

**هەڵپڕوسقان:** هەڵپڕوزقان [ف] نگا: هەڵپڕوزقان.

**هەڵپڕوسقاندن:** هەڵپڕوزقانن [ف] نگا: هەڵپڕوزقانن.

**هەڵپڕوسقانن:** هەڵپڕوزقانن [ف] نگا: هەڵپڕوزقانن.

**هەڵپڕوسقیان:** هەڵپڕوسقان [ف] نگا: هەڵپڕوزقان.

**هەڵپڕوُکان:** ۱) نیوەسوُتانی پێستو شتی تر؛ ۲) هەڵپڕوُزانی موُ [ف] ۱) نیمسوزشدن؛ ۲) سوختن مو.

**هەڵپڕوُکاندن:** ۱) سوُتاندن کەم‌تاکورتێك؛ ۲) سوُتاندنی موُ [ف] ۱) سوزاندن سطحی؛ ۲) سوزاندن مو.

**هەڵپڕوُکانن:** هەڵپڕوُکاندن [ف] نگا: هەڵپڕوُکاندن.

**هەڵپڕوُکین:** ۱) کەمێ سوُتان؛ ۲) هەڵپڕوُزان [ف] ۱) نیمسوزشدن؛ ۲) سوختن مو.

**هەڵپریوان:** هەڵپروان [ف] نگا: هەڵپروان.

**هەڵپریواندن:** هەڵپرواندن: (نانەکە **هەڵپریوێنە**، گەنمەشامیم **هەڵپریواند**) [ف] نگا: هەڵپرواندن.

**هەڵپزگڕان:** هەڵبڕزكان، هەڵبزڕكان [ف] نگا: هەڵبڕزكان.

**هەڵپسان:** پسان بەهۆی کێشران بۆ سەرەوە [ف] گسستن به سبب کشیده شدن.

**هەڵپساندن:** کێشان بۆ سەرەوەو پساندن: (سەری چوڵەکەی **هەڵپساند**) [ف] برکشیدن و گسلانیدن.

**هەڵپساو:** قرتاو بەهۆی کێشران بۆ سەرەوە [ف] گسسته دراثر کشیدن.

**هەڵپسێن:** کەسێ کە شتێ دەکێشێتەسەرو دەیپسێنێ [ف] برکشندهٔ گسلاننده.

**هەڵپسێندراو:** هەڵپساو [ف] نگا: هەڵپساو.

**هەڵپسێنراو:** هەڵپساو [ف] نگا: هەڵپساو.

**هەڵپشافتن:** پشاوتن، لە ناودەستا گوشین [ف] فشردن و مچاله‌کردن.

**هەڵپشافتی:** پشاوتو [ف] مچاله‌شده.

**هەڵپشاوتن:** هەڵپشافتن [ف] فشردن و مچاله‌کردن.

**هەڵپشاوتە:** گوشراو لە دەستا [ف] مچاله‌شده.

**هەڵپشکوُتن:** ۱) لەپڕ پەیدابوُن؛ ۲) گڕ بەرزەوەبوُنی ئاگر؛ ۳) پەیدابوُنی زیپکەی زۆر لە پێست [ف] ۱) ناگهان پدیدارشدن؛ ۲) زبانه‌کشیدن ناگهانی آتش؛ ۳) دمیدن جوشهای بسیار بر پوست.

**هەڵپشێو:** کەسێ کە شتێ لە ناودەستا دەگوشێو دەشێلێ [ف] مچاله‌کننده و چلاننده.

**هەڵپشێوراو:** هەڵپشاوتە [ف] مچاله‌شده.

**هەڵپشێوە:** فەرمان بە هەڵپشاوتن [ف] امر به مچاله‌کردن.

**هەڵ پفان:** ١) هەڵمسان، ماسین؛ ٢) بریتی لە تووڕەبوون و باکردن لەڕکان؛ ٣) هەڵاتن و بەرزبوونەوەی هەویر ف ١) بادکردن، آماسیدن؛ ٢) کنایە از بسیار خشمگین شدن؛ ٣) برآمدن خمیر.

**هەڵ پفـانـدن:** ١) ئاوساندن؛ ٢) تووڕەکردن؛ ٣) هەڵهێنانی هەویر ف ١) نفخ دادن، متورّم کردن؛ ٢) خشمگین کردن؛ ٣) برآوردن خمیر.

**هەڵ پفاو:** باکردو ف بادکردە.

**هەڵ پفیان:** هەڵپفان ف نگا: هەڵپفان.

**هەڵ پفیاو:** هەڵپفاو ف بادکردە.

**هەڵ پفیای:** هەڵپفاو ف بادکردە.

**هەڵ پفین:** هەڵپفان ف نگا: هەڵپفان.

**هەڵ پلو:** کاری لابەلاو بێ فایدە ف کار بیهودە.

**هەڵ پڵۆخان:** داپڵۆخان ف از هم دررفتن در اثر حرارت زیاد، لەشدن از گرما.

**هەڵ پڵۆخـــانـدن:** بوونەهۆی داپڵۆخـان: (ئـاوی کوڵاوی پێداکـرد هەڵی پڵۆخاند) ف لەکردن بەوسیلۀ حرارت.

**هەڵ پڵۆخاو:** لەبەریەك‌چووگ لە تینی ئاگر: (گۆشتەکە **هەڵ پڵۆخاوە**) ف از هم دررفتە و لەشدە دراثر حرارت زیاد.

**هەڵ پڵۆخین:** هەڵپڵۆخان، داپڵۆخان ف نگا: داپڵۆخان.

**هەڵ پڵۆسکان:** گیان‌دان، لە ژیان بێ‌بەش بوون ف مردن، جان دادن.

**هەڵ پڵۆسکانن:** مراندن ف میراندن.

**هەڵ پڵۆسکیاگ:** مرێندراو ف کشتە شدە.

**هەڵ پڵۆسکیان:** گیان‌دان ف جان دادن.

**هەڵ پۆقین:** هەڵتۆقین، هەڵتۆقان ف نگا: هەڵتۆقان.

**هەڵپـە:** ١) پەلـە؛ ٢) تەمـاح؛ ٣) هەنـاسەدانی سەگ لەگەرمان ف ١) شتاب؛ ٢) آز، شرە؛ ٣) لەلەزدن سگ از گرما.

**هەڵپـــەڕ:** ١) بزووتن بە تەکـان: (هـەڵپـەڕ داپـەڕت نیە)؛ ٢) بەرەوژوور هەڵبەزین ف ١) جنبش و تکان؛ ٢) جست و خیز.

**هەڵپەڕا:** بەرەوژوور خۆی حەوادا ف جهید.

**هەڵپەڕان:** خۆحەوادان بەتوندی ف جهیدن، جهش.

**هەڵ پەڕاندن:** ڕەقساندن ف رقصانیدن.

**هەڵ پەرتـــاوتــن:** ١) پەرتـــاوتــن، لکـــەدار پەڕانـــدن؛ ٢) بریتـی لە ڕێك‌وپێك‌کردنی شتی ناڕێك: (نـاوماڵەکە **هەڵ پەرتێوە**) ف ١) هرس کردن؛ ٢) پیرایە، تنظیم.

**هەڵپەڕداپەڕ:** ١) هاتوچۆی بە پەلەپەل؛ ٢) بریتی لە کۆشش و تەقالای زیرەکانە ف ١) جست‌وخیز؛ ٢) کنایە از نشاط در کار.

**هەڵ پەرست:** کەسێ کە بۆ قازانجی خۆی گوێ ناداتە پەیمان و بەڵێن ف فرصت طلب.

**هەڵپەڕکێ:** ڕەقس و سەما ف رقص.

**هەڵپەڕوداپەڕ:** هەڵپەڕداپەڕ ف نگا: هەڵپەڕداپەڕ.

**هەڵپەڕین:** سەماکردن، ڕەخسین ف رقصیدن.

**هەڵپەڕێن:** ڕەقس‌پێ‌کەر ف رقصاننده.

**هەڵپەز:** مناڵدان، تۆڵدان ف بچەدان، رحم.

**هەڵ پەســارتن:** ١) شتێ بە شتێکـەوە پاڵـدان: (ئـەوگەسکـە بە دیوار **هەڵ پەسێرە**)؛ ٢) بریتی لە لەکـــارخستن و چاوەنـــۆڕڕاگرتن ف ١) تکیەدان چیزی بە چیزی دیگر؛ ٢) کنایە از معلّق کردن از کار.

**هەڵ پەسارتو:** ١) پاڵ بەشتێکەوە دراو؛ ٢) بێکارکراوی بەئامانەتی ف ١) تکیە بر چیزی دادە؛ ٢) معلّق شدە از کار.

**هەڵ پەسارتە:** هەڵپەسارتو ف نگا: هەڵپەسارتو.

**هەڵ پەساردن:** هەڵپەسارتن ف نگا: هەڵپەسارتن.

**هەڵ پەساردو:** هەڵپەسارتو ف نگا: هەڵپەسارتو.

**هەڵ پەساردە:** هەڵپەسارتو ف نگا: هەڵپەسارتو.

**هەڵ پەسێران:** ١) بەشتێکـــەوە پاڵدران؛ ٢) بریتی لە بیکـــارکـــران و چاوەنۆڕکران ف ١) تکیە بە چیزی دادە شدن؛ ٢) کنایە از معلّق شدن از کار.

**هەڵ پەسێراو:** هەڵپەسارتو ف نگا: هەڵپەسارتو.

**هەڵ پەقژین:** مچورك پێداهاتن و لەرزین ف چندش و تیرکشیدن اندام.

**هەڵ پەل:** داری هەڵپەرتاوتو ف هرس شدە.

**هەڵ پەلە:** ١) کاری لابەلاو بێ‌فایدە؛ ٢) وڕاوە ف ١) کار بیهودە؛ ٢) هذیان.

**هەڵ پەنمان:** ١) هەڵامسان، هەڵپفان؛ ٢) ڕاپەڕین لە خەو لەنکاو ف ١) بادکردە، آماسیدە؛ ٢) ناگهان از خواب پریدن.

**هەڵ پەنمانن:** ١) هەڵامساندن، هەڵپفاندن؛ ٢) لەپڕ لەخەو ڕاپەڕاندن ف ١) آماسانیدن؛ ٢) یکهو از خواب بیدارکردن.

**هەڵ پەنمین:** ١) هەڵپەنمان؛ ٢) ڕاچڵەکین ف ١) نگا: هەڵپەنمان؛ ٢) یکەخوردن.

**هەڵپەهەڵپ:** هەناسەدانی زۆری سەگ لەگەرمان ف لەلەزدن پیاپی سگ از شدّت گرما.

**هەڵ پیت:** پەرتاوتن، هەڵپەرتاوتن ف هرس و پیرایۀ درخت.

**هەڵ پیتــانـدن:** لك‌پەرتاندن و جوان‌کردنی دار، هەڵپەرتاوتن ف هرس کردن و پیرایش درخت.

**هەڵ پێچ:** ١) لە خوارە بۆ سەرەوە بەســـەریەکـــا پێچـــان؛ ٢) جۆرێ ئاواڵ‌کراسی ژنانە: (دەرپێی **هەڵ پێچی** دەبەردایە) ف ١) ورمالیدن؛ ٢) نوعی شلوار زنانە.

**هەڵ پێچان:** ١) هەڵپێچ، بەسەریەکا پێچان بۆ سەرەوە؛ ٢) زۆربۆهێنان و گەڕتێ‌هاڵاندن: (**هەڵی پێچاوم** جلکی دەوێ)؛ ٣) پێچانەوەی دۆڵمەی ئاپراغ؛ ٤) بادانی ڕیشو ف ١) ورمالیدن؛ ٢) با اصرار وادار کردن؛ ٣) پیچیدن دلمۀ برگ مو؛ ٤) تاب دادن پرز کنارۀ لباس.

**هەڵ پێچـــاو:** ١) لە خوار بۆ سەر پێچ‌دراو؛ ٢) زۆربـۆهـاتـو لە لایەن کەسێکەوە؛ ٣) نوشتاوەی ئاپراغ؛ ٤) ڕیشوی بادراو ف ١) ورمالیدە؛ ٢) زیرفشار قرار گرفتە؛ ٣) دلمۀ پیچیدە؛ ٤) پرز تاب‌خوردە.

**هەڵ پێچراو:** هەڵپێچاو ف نگا: هەڵپێچاو.

**هەڵ پێچرای:** هەڵپێچاو ف نگا: هەڵپێچاو.

**هەڵ پێچیاگ:** هەڵپێچاو ف نگا: هەڵپێچاو.

**هەڵ پێچیان:** هەڵپێچان ف نگا: هەڵپێچان.

**هەڵ پێك:** داخـران، بەسـەریەکـاهـاتنی دولای درگاو پەنجەرەو... ف بستەشدن، برهم آمدن و جفت شدن در و پنجره و....
**هەڵ پێکان:** داخستن، بەسەریەکا جوُت کردن: (درگاکە **هەڵ پێکە**) ف بستن، برهم آوردن، جفت کردن.
**هەڵ پێکانن:** هەڵ پێکان ف نگا: هەڵ پێکان.
**هەڵ پێکران:** هەڵ پێك ف نگا: هەڵ پێك.
**هەڵ پێکراو:** داخراو، پێوەدراو ف بستە، برهم آمدە، جفت شدە.
**هەڵ پێکیاگ:** هەڵ پێکراو ف نگا: هەڵ پێکراو.
**هەڵپین:** هەناسەسواری سەگ لەگەرمان ف تنگی نفس سگ از شدت گرما.
**هەڵتاش:** تاشین بەرەوژوُر ف تراشیدن از پایین به بالا.
**هەڵ تاشان:** هەڵتاش ف نگا: هەڵتاش.
**هەڵ تاشین:** هەڵتاش ف نگا: هەڵتاش.
**هەڵ تاواندن:** عەزم کردن، هەزم کردن ف هضم کردن.
**هەڵ تاوین:** هەزم، عەزم ف هضم.
**هەڵ تاوێن:** هـەزم کەر: (ورگی من بەردیـش **هەڵ ئەتـاوێنێ**) ف هضم کنندە.
**هەڵ تڕاندن:** دەرکردن بە سوُکایەتی ف راندن با اهانت.
**هەڵ تڕانن:** هەڵ تڕاندن ف راندن با اهانت.
**هەڵ ترنگانن:** سڵ بوُن و خۆ زیزکردن ف رمیدن و ترسیدن.
**هەڵ تروشکان:** قـونەڵتس‌دان، لەسـەر چینچـك ڕۆنیشتـن ف چمباتمە نشستن.
**هەڵ تروشکاندن:** لەسەر چینچك دانیشاندن ف چمباتمەنشانیدن.
**هەڵ تروشکانن:** هەڵ تروشکاندن ف چمباتمەنشانیدن.
**هەڵ تروشکاو:** لەسەر چینچك نیشتو ف چمباتمە نشستە.
**هەڵ تروشکین:** هەڵ تروشکان ف چمباتمە نشستن.
**هەڵ تروشە کان:** هەڵ تروشکان ف چمباتمە نشستن.
**هەڵتڕە:** لاچۆ لەبەر چاوم، وەدەرکەوە ف گم‌شو.
**هەڵ ترە کـان:** ١) ترە کـانن، تەقـاندن؛ ٢) دەرزیێ بردن ف ١) منفجر کردن؛ ٢) شکافتن.
**هەڵ ترە کیان:** هەڵ ترە کان ف نگا: هەڵ ترە کان.
**هەڵ تلۆپان:** تۆپین، کەوتین ف مردن نجس، سَقط شدن.
**هەڵ تلۆپین:** هەڵ تلۆپان ف مردن نجس.
**هەڵ تلیشان:** لەبەریەك چوُن، لە سەر بۆ خوار دادڕان ف از بالا به پایین دریدە شدن.
**هەڵ تلیشاندن:** لەبەریەك بردن، دادڕین ف ورشکافتن، وردریدن.
**هەڵ تلیشانن:** هەڵ تلیشاندن ف ورشکافتن، وردریدن.
**هەڵ تلیشاو:** لە سەر تا خوار دادڕاو ف وردریدە، ورشکافتە.
**هەڵ توُتـان:** هەڵ تروشکـان، قوُنـەڵتس‌دان: (کـوُچـك **هەڵ توُتـا**) ف چمباتمە نشستن.
**هەڵ توترین:** هەڵ توُتان ف چمباتمە نشستن.
**هەڵ توُتە کان:** هەڵ توُتان ف چمباتمە نشستن.
**هەڵ توُتە کاو:** هەڵ تروشکاو ف چمباتمە نشستە.
**هەڵ توُتە کیو:** هەڵ تروشکاو ف چمباتمە نشستە.
**هەڵ توُتێ:** لەسەر چینچك دانیشە ف چمباتمە بنشین.
**هەڵ توُڕان:** ١) بەلەفیرە، زگەشۆرە؛ ٢) جوُتەهاویشتن ف ١) اسهال؛ ٢)جفتك پرانی.
**هەڵ توُڕانـدن:** ١) جوُتـەهـاویشتن و قنـگ بەرزکردنەوە؛ ٢) فیڕاندن، زگ چوُن ف ١) رمیدن و جفتك پراندن؛ ٢) اسهال شدن.
**هەڵ توُڕانن:** هەڵ توُڕاندن ف نگا: هەڵ توُڕاندن.
**هەڵ توروشکان:** هەڵ تروشکان ف چمباتمە نشستن.
**هەڵ توروشکین:** هەڵ تروشکان ف چمباتمە نشستن.
**هەڵتۆز:** جوُتەهاویشتن و قوشقی بوُن ف جفتك پرانی و رمیدن.
**هەڵتوُز:** هەڵتۆز ف نگا: هەڵتۆز.
**هەڵ تۆزاندن:** هەڵتۆزکردن ف جفتك پراندن و رمیدن.
**هەڵ توُزاندن:** هەڵ تۆزاندن ف نگا: هەڵ تۆزاندن.
**هەڵ تۆقـان:** ١) قیتـەوەبـوُن: (کـارگ **هەڵ تۆقی**، بەرد لە سەرم درا **هەڵ تۆقیوە**)؛ ٢) لە بەرزیەوە تەقـانـدن: (دەمـانچـەی بەسـەردا **هەڵ تۆقاند**) ف ١) بیرون زدن؛ ٢) ازبالا ترکانیدن.
**هەڵ تۆقـانـدن:** ١) قیتـەوە کـردن؛ ٢) تەقـاندن ف ١) برجستە کردن، برآوردن؛ ٢) ترکاندن.
**هەڵ تۆقانن:** هەڵ تۆقاندن ف نگا: هەڵ تۆقاندن.
**هەڵ تۆقاو:** بەرزو قیتەوەبوُگ ف برآمدە از سطح، بیرون زدە.
**هەڵ تۆقیاگ:** هەڵ تۆقاو ف نگا: هەڵ تۆقاو.
**هەڵ توقیان:** هەڵ تۆقان ف نگا: هەڵ تۆقان.
**هەڵ تۆقین:** هەڵ تۆقان ف نگا: هەڵ تۆقان.
**هەڵ تۆقیو:** هەڵ تۆقاو ف نگا: هەڵ تۆقاو.
**هەڵ تەزینەوە:** ڕاپەڕین، شۆڕش کردن ف قیام، نهضت.
**هەڵ تەقـان:** ١) لەبـەریەك چوُن: (خانوە کە **هەڵ تەقاوە**)؛ ٢) دادڕانی درواو؛ ٣) توُشـی یەك هاتـن ف ١) ازهم گُسستن؛ ٢) جِرخـوردن بخیەزدە؛ ٣) برخورد.
**هەڵ تەقیان:** هەڵ تەقان ف نگا: هەڵ تەقان.
**هەڵ تەقین:** هەڵ تەقان ف نگا: هەڵ تەقان.
**هەڵتەك:** هەڵ تە کان ف نگا: هەڵ تە کان.
**هەڵ تە کـان:** ١) لە خوار بۆ سەر تێك‌چوُن؛ ٢) بەرەژوُرچوُنی ئەندامی لەش: (چـاوی لێ **هەڵ تە کـانـد**، برۆی **هەڵ تە کـانـد**، شان **هەڵ تە کێنە**)؛ ٣) داتەقاندنی دەغڵ و توتن: (توتنە کە **هەڵ تە کێنە**) ف ١) از پایین به بالا دررفتن و متـلاشی شدن؛ ٢) بەبـالا جستنِ اعضاءِ بدن؛ ٣) باددادن غلّە و....
**هەڵ تە کاندن:** ١) تێك و پێك‌دان: (بە بۆمبا خانوە کەی **هەڵ تە کاند**)؛ ٢) بڵنـدکردن و بەرەژوُربردنی ئەندامی لەش: (برۆی **هەڵ تە کاند**، شان **هەڵ تە کێنـە**)؛ ٣) تە کـانـدنی شت: (بـەڕە کـە **هەڵ تە کێنـە**)؛ ٤) داتەقاندنی دەغڵ و... ف ١) متلاشی کردن؛ ٢) بالا انداختن اعضاءِ بدن؛ ٣) تکانیدن؛ ٤) باددادن غلّە و....

**هەڵتەكانن:** هەڵتەكاندن ف نگا: هەڵتەكاندن.

**هەڵتـەك و پەڵتەك:** بە لۆقاوی درێژ و بەپەلە ڕۆیشتن، قەترەكردن ف با گامهای بلند و با شتاب رفتن.

**هەڵتەك وەدەڵتەك:** هەڵتەك و پەڵتەك ف با گامهای بلند و با شتاب رفتن.

**هەڵتەك هەڵتەك:** بە پشوولەسەرخۆیی هاتن ف سلانەسلانە راەرفتن.

**هەڵتەكیان:** هەڵتەكان ف نگا: هەڵتەكان.

**هەڵتەكین:** هەڵتەكان ف نگا: هەڵتەكان.

**هەڵتەكێن:** ١) لەبـەریەك بەر؛ ٢) بڵندكەری ئەندام؛ ٣) تەكێنی بەڕەو لێفەو... ف اسم فاعل «هەڵتەكاندن».

**هەڵتەكێنــە:** ١) فەرمـــان بە هەڵتەكـــانـدن؛ ٢) هەڵتەكێن: (كلك هەڵتەكێنە) ف ١) امر به «هەڵتەكاندن»؛ ٢) بالابرنده، جنباننده.

**هەڵتیز:** هەڵتۆز ف نگا: هەڵتۆز.

**هەڵتیزان:** هەڵتۆزان ف جفتك پرانی و رمیدن.

**هەڵتیزاندن:** هەڵتۆزاندن ف جفتك پراندن و رمیدن.

**هەڵتیقان:** هەڵبەزین بۆ بازی كردن ف بازی كردن و جست وخیز.

**هەلجاندن:** پەڕە كردن بە هەلاج ف زدن پنبه و پشم.

**هەڵجۆزان:** هەڵتۆزان ف جفتك پرانی و رمیدن.

**هەڵجۆزانن:** هەڵتۆزاندن ف جفتك پراندن و رمیدن.

**هەڵجۆزین:** هەڵتۆزان ف جفتك پرانی و رمیدن.

**هەڵجۆزێن:** حەیوانی جۆتەهاوێژ و سڵ ف حیوان جفتك پران ورموك.

**هەڵجەر:** خێل، چاوخوار ف لوچ، احول.

**هەڵجیاندن:** ئامادەكردن بە نیواونیوی، گەلاڵەكردن ف كم و بیش آمادەكردن.

**هەڵچ:** كارگ، كوارگ ف قارچ.

**هەڵچران:** ١) هـەڵپچڕان؛ ٢) دڕان ف ١) نگا: هـەڵپچڕان؛ ٢) دریدەشدن.

**هەڵچڕاندن:** هەڵپچڕاندن ف نگا: هەڵپچڕاندن.

**هەڵچڕاو:** هەڵپچڕاو ف نگا: هەڵپچڕاو.

**هەڵچرچــان:** ١) چرچ و لۆچ تێكەوتـــن؛ ٢) سیس بوون ف ١) چین برآوردن؛ ٢) پژمردەشدن.

**هەڵچرچاو:** ١) چـرچ بووگ؛ ٢) سیـس بووگ ف ١) پـرچین شدە؛ ٢) پژمردەشدە.

**هەڵچرچیاگ:** هەڵچرچاو ف نگا: هەڵچرچاو.

**هەڵچڕین:** هەڵپچڕین ف نگا: هەڵپچڕین.

**هەڵـچـن:** ١) كەسـێ كە شت لەســـەریەك دادەنێ؛ ٢) زەمینێ كە ئاو هەڵدەمژێ ف ١) برهم چین؛ ٢) زمینی كە آب را زود می‌مكد.

**هەڵچناو:** لەسەریەك كەڵەكەكراو ف برهم نهادە شدە، انباشتە شدە.

**هەڵچنراو:** هەڵچناو ف انباشتە.

**هەڵچنك:** قاقەزی مەرەكەف هەڵچن ف كاغذ خشك كن.

**هەڵچنیاگ:** هەڵچناو ف برهم نهادە شدە، انباشتە شدە.

**هەڵچنین:** ١) لەسەریەك بە بڵندی كەڵەكەكردن؛ ٢) مژینی ئاو بۆ زەوی ف ١) برهم انباشتن؛ ٢) مكیدن زمین آبرا.

**هەڵچو:** ١) بە دار یان بە شاخـا سەركـەوتو؛ ٢) كوڵاوی سەرڕێژكردو: (شیرە كە **هەڵچوە**)؛ ٣) هەراش، زوو گەورە بووگ: (منالێكی **هەڵچوە**)؛ ٤) بێ فكر لە كاردا، سەرەڕۆ؛ ٥) بڵندبوونەوە: (دار تا عاسمان **هەڵچوە**) ف ١) بالارفتـه، صعـودكـرده؛ ٢) جوشیده سر رفتـه؛ ٣) بالنده؛ ٤) خودسر دركارها؛ ٥) مرتفع شده، بالارفته.

**هەڵچـو:** ١) كەسێ كاری سەربەخۆ دەكا؛ ٢) فەرمان بە ئامادەبوون بۆ شەقتێ‌هەڵـدان؛ ٣) فەرمـانـە بە سەركەوتن لە دارو بەرزایی ف ١) خودسـر دركـار؛ ٢) امـر بە آمادەشدن برای تیپاخوردن؛ ٣) امر بە بالارفتن از بلندی.

**هەڵچۆڕان:** ئاخرتنۆك ڕژان ف تا آخرین قطره چكیدن.

**هەڵچۆڕاندن:** دوامین تنۆك ڕژاندن ف ریختن آخرین قطره.

**هەڵچۆڕاو:** هیچ تیانەماو لە تراو ف تهی شدە از آب و مایع.

**هەڵچۆڕیان:** هەڵچۆڕان ف نگا: هەڵچۆڕان.

**هەڵچۆڕین:** هەڵچۆڕان ف ریزش آخرین قطره.

**هەڵچۆڕیو:** هەڵچۆڕاو ف تهی شده از مایع.

**هەڵچۆقان:** ١) چۆقان لەسەر ئاگر؛ ٢) لەرزین لەسەرمان؛ ٣) لەرزین لەبـەر نۆبـەتێ ف ١) صدای روغن تفیده؛ ٢) لرزش از سرمـا؛ ٣) لرزش از تب و لرز.

**هەڵچۆقاو:** قاڵكراو ف تفیده، روغن تفیده.

**هەڵچۆقین:** هەڵچۆقان ف نگا: هەڵچۆقان.

**هەڵچۆقیو:** هەڵچۆقاو ف روغن تفیده.

**هەڵچوون:** ١) دەبـــالاكـــردن؛ ٢) لە بڵنـد سەركـەوتن؛ ٣) ئامـادەی تێ‌هەڵـدان بوون؛ ٤) سەرڕێژكـردنی كوڵاو لەسەر ئاگر؛ ٥) دابوون بۆ بەسەر پشتا بازدان؛ ٦) برێتی لە توڕەبوون ف ١) سریع رشدكردن؛ ٢) از بلنـدی بالا رفتن؛ ٣) آمادە تیپـاخوردن شدن؛ ٤) سررفتن مایع جوشان؛ ٥) خم شدن برای پرش همبازی؛ ٦) كنایه از خشمگین شدن.

**هەڵچە:** ١) عەلوكە، ئاڵوچە؛ ٢) دابە لە كایە؛ ٣) حازربە بۆ تێ‌هەڵدان؛ ٤) لە بڵنـدی سەركەوە: (بەوداره **هەڵچە**) ف ١) آلوچه؛ ٢) خم شو برای پرش؛ ٣) آمادە تیپاخوردن باش؛ ٤) از بلندی بالارو.

**هەڵچەرخ:** وەرسوڕ، زڤڕ ف چرخش.

**هەڵچەرخان:** وەرسوڕان، زڤڕین ف ورچرخیدن.

**هەڵچەرخاندن:** وەرسوڕاندن ف ورچرخاندن.

**هەڵچەرخیان:** هەڵچەرخان ف ورچرخیدن.

**هەڵچەرخین:** هەڵچەرخان ف ورچرخیدن.

**هەڵچەقـــان:** ١) تێ‌ڕۆچـــوون؛ ٢) دەنـاو قوڕڕاكـران ف ١) خلیدن، فرورفتن؛ ٢) درگل فروشدن.

**هەڵچەقـانـدن:** ١) تێ‌ڕۆكردنی دەرزی و دڕو؛ ٢) دەقوڕڕاكردن ف ١) خلانیدن؛ ٢) در زمین فروكردن.

**هەڵچەقاو:** ١) ڕۆچوونی شتی سەرتیژ؛ ٢) دەزەوی ڕاكراو ف ١) خلیده؛ ٢) فروشده در زمین.

**هەڵچەقین:** هەڵچەقان ف نگا: هەڵچەقان.

**هەڵچەقیو:** هەڵچەقاو ف نگا: هەڵچەقاو.
**هەڵخران:** وەبەر تاو دران بۆ وشك بوونەوە ف پهن کردن در آفتاب برای خشك شدن.
**هەڵخڕان:** بزوان، هەڵتەکانی دەفرێ کە شتی زۆری وردی تێدایە: (جەواڵی گوێز **هەڵخڕێنە**) ف تکان خوردن ظرف یا جعبه با محتویات ریز.
**هەڵخڕاندن:** ۱) تەکان پێدان و بزواندنی دەفری پڕ لە شتی ورد؛ ۲) برێتی لە هانەدان و فریودان؛ ۳) لەناو دەستا خڕ هەڵدان ف ۱) تکان دادن ظرف یا جعبه با محتویات ریز؛ ۲) کنایه از تحریك و فریب دادن؛ ۳) دردست گرد کردن.
**هەڵخڕانن:** هەڵخڕاندن ف نگا: **هەڵخڕاندن.**
**هەڵخراو:** بەرتاودراو بۆ وشك بوون ف پهن شده در آفتاب برای خشك شدن.
**هەڵخڕاو:** ۱) دەفری پڕ لە وردەشت تەکان پێدراو؛ ۲) فریودراو؛ ۳) دنەدراو ف ۱) ظرف یا جعبهٔ محتوی خرده‌ریز تکان خورده؛ ۲) فریب خورده؛ ۳) تحریك شده.
**هەڵخریاگ:** هەڵخراو ف نگا: هەڵخراو.
**هەڵخڕیاگ:** هەڵخڕاو ف نگا: هەڵخڕاو.
**هەڵخریان:** هەڵخران ف نگا: هەڵخران.
**هەڵخڕیان:** هەڵخڕان ف نگا: هەڵخڕان.
**هەڵخز:** بە خشکە بەرەوژوورچوون ف به بالا خزیدن.
**هەڵخزان:** هەڵخز ف به بالا خزیدن.
**هەڵخزیان:** هەڵخزان ف نگا: هەڵخزان.
**هەڵخزین:** هەڵخزان ف نگا: هەڵخزان.
**هەڵخستن:** ۱) بۆ سەرەوە فڕێدان: (خشت **هەڵخستن** بۆ بەنا)؛ ۲) بەرتاودان بۆ وشك بوون؛ ۳) چۆنیەتی بیچمی دروست کراو: (خانووەکەی باش **هەڵخستوە**)؛ ۴) دەرهاویشتنی دەغڵ لە شەختە؛ ۵) جووتەهاویشتن: (لەقە **هەڵدەخاتەوە**)؛ ۶) گوێ ڕاگرتن بۆ بیستن ف ۱) به‌بالا پرتاب کردن؛ ۲) پهن کردن در آفتاب؛ ۳) طرح‌ریزی؛ ۴) براندازی غلّه از سرما؛ ۵) جفتك پراندن؛ ۶) گوش فرادادن.
**هەڵخستنەوە:** ۱) جووتەهاویشتن؛ ۲) سەماو خۆ حەوادان لە خۆشیان ف ۱) جفتك پراندن؛ ۲) پایکوبی و جست و خیز از شادی.
**هەڵخشان:** هەڵخزان ف به‌بالا خزیدن.
**هەڵخشیان:** هەڵخزان ف به‌بالا خزیدن.
**هەڵخشین:** هەڵخزان ف به‌بالا خزیدن.
**هەڵخلان:** هەڵخڕان ف نگا: هەڵخڕان.
**هەڵخلاندن:** هەڵخڕاندنی دەفری پڕ لە شتی ورد ف تکان دادن ظرف محتوی خرده‌ریز.
**هەڵخلانن:** هەڵخلاندن ف نگا: هەڵخلاندن.
**هەڵخڵەتان:** فریوخواردن ف فریب خوردن.
**هەڵخڵەتاندن:** خاپاندن ف فریب دادن.
**هەڵخڵەتاو:** خاپاندی، فریودراو ف فریب خورده.
**هەڵخڵەتێن:** خاپینۆك ف فریبکار.
**هەڵخڵەتێنە:** هەڵخڵەتێن: (شوان **هەڵخڵەتێنە**) ف فریبکار.
**هەڵخلیسك:** جێگەی لووسی سەهۆڵاوی ف لیزگاه.
**هەڵخلیسکان:** شەمتین ف لغزیدن.
**هەڵخلیسکاندن:** ۱) هەڵخلیسکان؛ ۲) بوونەهۆ بۆ شەمتینی یەکێ ف ۱) لغزیدن؛ ۲) لغزاندن.
**هەڵخلیسکاو:** شەمتی ف لغزیده.
**هەڵخلیسکین:** خلیسکان، شەمتین ف لغزیدن، لیزخوردن.
**هەڵخلیسکێن:** ۱) بازی شەمتین؛ ۲) جێگەی خلیسك ف ۱) سرسره بازی؛ ۲) جای لیزخوردن.
**هەڵخلیسکێنە:** هەڵخلیسکێن ف نگا: هەڵخلیسکێن.
**هەڵخواز:** هەڵپەرست ف فرصت‌طلب.
**هەڵخوراندن:** خوراندن لەخوارەوە بۆ سەرەوە: (لاقت **هەڵمەخورێنە**) ف خاراندن از پایین به بالا.
**هەڵخورانن:** هەڵخوراندن ف نگا: هەڵخوراندن.
**هەڵخۆزان:** هەڵچوون بەرەوبالا ف بالارفتن از.
**هەڵخۆزانن:** بۆ بالا کێشان ف به‌بالاکشیدن.
**هەڵخۆزتن:** هەڵخۆزان ف بالارفتن از.
**هەڵخۆزین:** هەڵخۆزان ف بالارفتن از.
**هەڵخۆستن:** هەڵخۆزان ف بالارفتن از.
**هەڵخووشان:** ۱) تێکچوونی کار: (کارەکەمان لێ **هەڵخووشا**)؛ ۲) بەدەمدا چوونەوە ف ۱) بهم خوردن کار، خراب شدن کار؛ ۲) رد کردن گفتار کسی.
**هەڵخول:** گەڕان و سووڕانی زۆر ف چرخش و گردش زیاد.
**هەڵخولان:** هەڵخول ف چرخش و گردش زیاد.
**هەڵخولاندن:** گەڕاندن و سووڕاندن ف چرخانیدن و گردانیدن.
**هەڵخوێن:** ۱) بەگوێدا خوێندن، زۆر نسحەت کردن؛ ۲) پێدا کاڵان ف ۱) اندرز بسیار گفتن، درگوش کسی زیاد خواندن؛ ۲) با عِتاب سرزنش کردن.
**هەڵخوێندن:** هەڵخوێن ف نگا: هەڵخوێن.
**هەڵخە:** ۱) بدە بەرتاو بۆ وشك بوون؛ ۲) ڕاگرە بۆ بیستن: (گوێ **هەڵخە**)؛ ۳) ئامادەی سزای دووراندن بە: (خۆت **هەڵخە** با سواری پشتت بم)؛ ۴) بۆ بالا باوێژە: (تۆ خشت بۆ وەستا **هەڵخە**) ف صیغهٔ امر از «هەڵخستن».
**هەڵخەڵەتان:** هەڵخڵەتان ف فریب خوردن.
**هەڵخەڵەتاندن:** هەڵخڵەتاندن، خاپاندن ف فریب دادن.
**هەڵخەڵەتاو:** فریودراو، خاپاندی ف فریب خورده.
**هەڵخەڵەتێن:** خاپینۆك ف فریبکار.
**هەڵخەڵەتێنە:** خاپینۆك ف فریبکار.
**هەڵداشتن:** لە بەرزەوە فڕێدان: (میزی **هەڵداشت**، خشتی **هەڵداشت**) ف از بالا انداختن، ازبلندی پرت کردن.
**هەڵدان:** ۱) بەرەوبالا فڕێدان؛ ۲) لێدان بە شاخ و شەق:

(شــەقــۆن تێ **هەڵـدان**)؛ ۳) بڵنـدکـردن و دامـەزرانـدنی چادر؛ ۴) مەحت کردن؛ ۵) قسە دەست پێ کردن: (لەجوابا **هەڵی دایە**)؛ ۶) دەفر لە ئاوی ڕاکـردن: (دەئـاوی **هەڵـدە**)؛ ۷) تێ وەردانی ئاو لە دەفر؛ ۸) گوتـنـی ناو: (نــاوان **هەڵــدە** بزانـین کێ بو)؛ ۹) گەشــەکــردن: (شیناوەردەکەت **هەڵی داوە**)؛ ۱۰) پایەبەرزبوون: (کاورا **هەڵی داوە**)؛ ۱۱) بار خستنـەسـەر بارەبـەر؛ ۱۲) زانینی ئەوەچیە: (مـەتـەڵـۆکـە **هەڵـدان**)؛ ۱۳) خۆنیشـاندان: (کارگ سەری **هەڵدا**، کاکم لە ئاسۆ سەری **هەڵدا**)؛ ۱۴) باکردنەناو، فوودان: (گوپت **هەڵدە**) ف ۱) بەبالا پرت کردن؛ ۲) زدن با شاخ یا تیپا؛ ۳) برپا کردن چادر؛ ۴) ستایش؛ ۵) سخن آغازکردن؛ ۶) با کاسه آب از چشمه یا منبع برکشیدن؛ ۷) آب در ظرف گردانـدن؛ ۸) نام گفتن؛ ۹) شکـوفا شدن: ۱۰) ترقّی کردن؛ ۱۱) بار بر پشت باربر انداختن؛ ۱۲) چیستان و معمّا را حلّ کردن؛ ۱۳) سر برآوردن، درديد قرار گرفتن؛ ۱۴) بادکردن، دمیدن.

**هەڵ دانــەوە:** ۱) بەرەوژوور بـردن: (پـەنجـەرەکـە **هەڵـدەوە**، پەردەی **هەڵـداوە**)؛ ۲) شین بوونەوە دوای بڕین؛ ۳) گەڕانەوەی نەخۆشی؛ ۴) پەشیمـان بوونـەوە بۆ شتێ: (سـەرلـەنـوێ **هەڵی داوەتەوە** و ماڵەکەی دەوێتەوە) ف ۱) بالازدن، بالابردن؛ ۲) پس از قطع شدن سر برآوردن، رویش دوباره؛ ۳) عودکردن بیماری؛ ۴) برای چیزی پشیمان شدن.

**هەڵ دران:** ۱) چەقێنـران: (کە سێدارە **هەڵدران** زانیم شتێ هەیە)؛ ۲) بەرپاکران: (چادر **هەڵدران**) ف ۱) نصب شدن بر زمین؛ ۲) برپاشدن چادر و....

**هەڵدڕان:** تەواو دڕان ف جرخوردن، کاملاً پاره شدن.

**هەڵدراو:** ۱) چەقێنراو؛ ۲) بەرپاکراو ف ۱) نصب شده؛ ۲) برپا شده.

**هەڵدڕاو:** جڕبردو، دڕاو ف جرخورده، پارەشده.

**هەڵ دراوە:** کۆگای بەسەریەکاکراو ف تودهٔ برهم ریخته.

**هەڵ دڕاوە:** جێگەی دادڕاو ف جای پاره شده.

**هەڵدرو:** تەقەڵدانی قەراغ ف بخیەزدن کنارەها.

**هەڵ دروان:** تەقەڵدرانی قەراغ ف دوختەشدن کنارەها.

**هەڵ درواندن:** هەڵدروون ف نگا: هەڵدروون.

**هەڵ درواو:** تەقەڵدراو لە کەنارەوە ف پارچهٔ دوختەشده از کنارەها.

**هەڵ دروون:** هەڵدرو، دروونی چوارکەناری شتێ ف دوختن کنارەهای پارچه.

**هەڵدڕهەڵدڕ:** زۆر دادڕاو: (سێڵاو زەویەکەی **هەڵدڕهەڵدڕ** کرد) ف بسیار دریده شده.

**هەڵ دریاگ:** بەرپاکراو ف برپاشده.

**هەڵ دڕیاگ:** هەڵدڕاو ف پارەشده.

**هەڵ دڕین:** تەواو دڕین ف پاره کردن، بردریدن.

**هەڵ دڕێن:** هەرشتێ دەدڕێنێ ف بردرنده.

**هەڵ دوور:** هەڵدرو ف نگا: هەڵدرو.

**هەڵ دوران:** هەڵدروان ف نگا: هەڵدروان.

**هەڵ دورانن:** هەڵدروون ف نگا: هەڵدروون.

**هەڵ دوراو:** هەڵدرواو ف نگا: هەڵدرواو.

**هەڵ دوریاگ:** هەڵدرواو ف نگا: هەڵدرواو.

**هەڵ دوریان:** هەڵدروان ف نگا: هەڵدروان.

**هەڵ دوریانن:** هەڵدروان ف نگا: هەڵدروان.

**هەڵ دورین:** هەڵدروون ف نگا: هەڵدروون.

**هەڵدە:** فەرمان بە هەڵدان ف صیغهٔ امر از «هەڵدان».

**هەڵـدەرە:** گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**هەڵدێ:** ۱) رادەکا، غاردەدا؛ ۲) مانگ و خۆر و ئەستێرە دێتە بەرچاو؛ ۳) هەڤـیر دەگاتـێ؛ ۴) مدە تەواودەبـێ: (وادەی قەرزەکـەم دووڕۆژی تر **هەڵـدێ**، ئەوژنـە عددەی **هەڵـدێ**)؛ ۵) دەزانـدرێ: (مەتەڵەکەتم بۆ **هەڵدێ**) ف ۱) می‌دود؛ ۲) طلوع می کند؛ ۳) خمیر برمی‌آید؛ ۴) مدّت سرمی‌آید؛ ۵) معمّا حلّ می‌شود.

**هەڵدێر:** ۱) تاڤگە؛ ۲) جێگەی زۆر بەرز و قیت لە شاخ و کێودا؛ ۳) کەسێ ئاو لە سەرەوە بەرەوخـوار دەڕژێنێ ف ۱) آبشـار؛ ۲) پرتگاه؛ ۳) آب ریزنده از بالا.

**هەڵ دێران:** لە بەرزیەوە فڕێدران بۆ خوار ف پرت شدن از بالا.

**هەڵ دێراو:** کەوتو لە باڵاوە ف پرت شده از بالا.

**هەڵدێرکە:** جێگەی زۆر سەخت کە پیاوی لێ دەکەوێ ف پرتگاه.

**هەڵدێرگە:** هەڵدێرکە ف پرتگاه.

**هەڵدێریاگ:** هەڵدێراو ف پرت شده از بالا.

**هەڵدێریان:** هەڵدێران ف ازبالا پرت شدن.

**هەڵ ڕژان:** ڕژان بەرەوخوار: (گەنمەکە **هەڵ ڕژا**) ف ریزش روبەپایین.

**هەڵ ڕژاندن:** ڕژاندن بەرەوژێر ف فروریختن، ریزش دادن به پایین.

**هەڵ ڕژانن:** هەڵڕژاندن ف نگا: هەڵڕژاندن.

**هەڵ ڕژاو:** ڕژاو بەرەوخوار ف فروریخته، بەپایین ریخته.

**هەڵ ڕژتن:** هەڵڕژاندن ف نگا: هەڵڕژاندن.

**هەڵ ڕژیاگ:** هەڵڕژاو ف نگا: هەڵڕژاو.

**هەڵ ڕژیان:** هەڵڕژان ف نگا: هەڵڕژان.

**هەڵ ڕشتن:** هەڵڕژتن ف هەڵڕژاندن.

**هەڵ ڕوانین:** لە خوارەوە بۆ سەرەوە تماشاکردن ف ازپایین بەبالا نگاه کردن.

**هەڵ ڕووشـان:** ۱) ڕووشـان، ڕووش بردن؛ ۲) تێکچوون، هەڵخووشان ف ۱) خراش برداشتن؛ ۲) بهم خوردن کار.

**هەڵ ڕووشاندن:** ۱) ڕووشاندن؛ ۲) تێکدانی کار ف ۱) خراشیدن؛ ۲) بهم زدن کار.

**هەڵ ڕووشانن:** هەڵڕووشاندن ف نگا: هەڵڕووشاندن.

**هەڵ ڕووشاو:** ۱) ڕووشان؛ ۲) تێکدراو ف ۱) خراشیده؛ ۲) بهم خورده.

**هەڵ ڕووشیاگ:** هەڵڕووشاو ف نگا: هەڵڕووشاو.

**هەڵ ڕووشیان:** هەڵڕووشان ف نگا: هەڵڕووشان.

**هەڵ ڕەخسان:** دەرفەت دەسکەوتن ف فرصت یافتن.

**هەڵ ڕەخسین:** هەڵڕەخسان ف فرصت یافتن.

**هەڵ ڕیان:** گوکردنی زۆر و بەپەلە ف ریدن بسیار و با عجله.

**هەڵــز:** ۱) گیایەکی بەنـاوبـانگی گەڵادەرزی‌یە لە تیرەی کەمـاو لۆیە بۆدەرمان دەشێ بەچێشت خۆشەو لەوەڕی چاکە؛ ۲) قەت، وێنجە [ف] ۱) گیاهی است برگ سوزنی که مصرف دارویی و خوراکی دارد؛ ۲) یونجه.

**هەڵزبڕ:** وەختی دروێنەی وێنجە [ف] موسم درو یونجه.

**هەڵزبەهین:** سیس‌هەڵگەڕان‌و زەردبوُنی وێنجە [ف] زرد و پژمرده شدن یونجه.

**هەڵ زڕان:** ۱) پڕبوُنی پێست لە زیپکە؛ ۲) دادڕان [ف] ۱) پرجوش شدن پوست؛ ۲) بردریده شدن، پاره‌شدن.

**هەڵ زڕاندن:** دڕاندن [ف] بردریدن، پاره‌کردن.

**هەڵ زڕانن:** هەڵ‌زڕاندن [ف] پاره‌کردن.

**هەڵ زڕاو:** دڕاو [ف] دریده، پاره‌شد.

**هەڵ زرنگان:** ۱) هانە، دنە؛ ۲) شڵەژان، شێوان‌و سەر لێ تێکچوُن [ف] ۱) تحریك؛ ۲) شوریدن.

**هەڵ زرنگاندن:** هانەدان، دنەدان [ف] تحریك کردن.

**هەڵ زرنگانن:** هەڵ‌زرنگاندن [ف] تحریك کردن.

**هەڵ زرنگیان:** هەڵ‌زرنگان [ف] نگا: هەڵ‌زرنگان.

**هەڵ زڕەپان:** هەڵ‌تۆقین [ف] نگا: هەڵ‌تۆقین، هەڵ‌تۆقان.

**هەڵ زڕیاگ:** پێستی پڕ لەزیپکە بوُگ [ف] پوست پرجوش شده.

**هەڵ زڕیان:** زیپکەی زۆر لە پێست هاتن [ف] جوش زیاد بر پوست زدن.

**هەڵ زڕیاو:** پێستی زۆر زیپکە لێ‌هاتگ [ف] پوست پرجوش شده.

**هەڵ زڵەپان:** پۆرگ دەرکردنی پێست [ف] جوش زدن پوست.

**هەڵ زڵەپین:** هڵ‌زڵەپان [ف] نگا: هەڵ‌زڵەپان.

**هەڵ زنین:** هەڵچوُن بەرەو باڵا [ف] بالارفتن از بلندی.

**هەڵ زوُران:** سوُتـانی توێی سەرەوەی گـۆشت [ف] سـوختن سطحی گوشت.

**هەڵ زەقینەوە:** هەڵ‌بەزینەوە لەترس‌و لەنکاو [ف] جستن ناگهانی از ترس.

**هەڵ زیپان:** هەڵ‌تۆقان، هەڵ‌تۆقین [ف] نگا: هەڵ‌تۆقان.

**هەڵ ژلـێویان:** ۱) پشێوینی ڕوُدان؛ ۲) دڵ‌تێکچـوُن‌و شڵەژان [ف] ۱) آشوب برپا شدن؛ ۲) دل بهم آمدن و پیچ و تاب خوردن.

**هەڵ ژمار:** سەرژمێری، ژماردن [ف] احصائیّه، آمار، سرشماری.

**هەڵ ژمـاردن:** ۱) هەڵ‌بژاردن؛ ۲) سەرژمـارکردن [ف] ۱) برگزیدن؛ ۲) سرشماری کردن.

**هەڵ ژماردو:** ۱) هەڵ‌بژێراو؛ ۲) ژمێردراو [ف] ۱) برگزیده؛ ۲) برشمرده.

**هەڵ ژماردە:** هەڵ‌ژماردو [ف] نگا: هەڵ‌ژماردو.

**هەڵ ژمێر:** ۱) هەڵ‌بژێر؛ ۲) کەسێ کە دانـەدانـە شتێ دەبژێرێ [ف] ۱) برگزیننده؛ ۲) برشمرنده.

**هەڵ ژمێراو:** هەڵ‌ژماردو [ف] نگا: هەڵ‌ژماردو.

**هەڵژیویان:** فلیقانەوە [ف] لەشدن.

**هەڵس:** راستەوەبە [ف] برخیز.

**هەڵسان:** ۱) راستەوەبوُن؛ ۲) لە لان دەرچوُنی نێچیر؛ ۳) بەرزبوُنەوەی ڕادەی ئاو؛ ۴) لە خەو بێداربـوُنەوە [ف] ۱) برخاستن؛ ۲) از مخفیگاه دررفتن نخجیر؛ ۳) بالاآمدن سطح آب؛ ۴) از خواب بیدار شدن.

**هەڵســانــدن:** ۱) راستـەوەکـردن؛ ۲) لە لان دەرخستن؛ ۳) لە خەو بێدارکـردن [ف] ۱) برخیزانـدن؛ ۲) ازلانه خارج کردن شکار؛ ۳) از خواب بیدار کردن.

**هەڵساندن:** ۱) شل‌و سست کردن؛ ۲) وردکردن وەك کوتانی گەنم؛ ۳) لاوازکردن؛ ۴) کەم‌کردن؛ ۵) رزاندن؛ ۶) خراپ کردن، لەکارخستن [ف] ۱) سست کردن؛ ۲) خردکـردن، کوبیدن؛ ۳) لاغرکردن؛ ۴) کم کردن؛ ۵) پوساندن؛ ۶) ازکارانداختن.

**هەڵسانن:** هەڵساندن [ف] نگا: هەڵساندن.

**هەڵسانەوە:** ۱) دوای کەوتن ڕاست‌بوُنەوە؛ ۲) لەنەخۆشی چابوُنەوە [ف] ۱) پس از افتادن باز برخاستن؛ ۲) از بیماری بهبودیافتن.

**هەڵساو:** بەرکاری هەڵسان [ف] صیغهٔ مفعولی «هەڵسان».

**هەڵ ساوین:** پیاماڵین، ساوین [ف] اندودن، مالیدن.

**هەڵ سپاردن:** هەڵ‌پەسارتن [ف] نگا: هەڵ‌پەسارتن.

**هەڵ سپێران:** هەڵ‌پەسێران [ف] نگا: هەڵ‌پەسێران.

**هەڵ سپێراو:** هەڵ‌پەسێراو [ف] نگا: هەڵ‌پەسێراو.

**هەڵ سپێریاگ:** هەڵ‌پەسێراو [ف] نگا: هەڵ‌پەسێراو.

**هەڵ سپێریان:** هەڵ‌پەسارتن [ف] نگا: هەڵ‌پەسارتن.

هەڵست: رابوُن، هەستان [ف] برخاستن.

**هەڵستان:** هەڵسان [ف] نگا: هەڵسان.

**هەڵستاندن:** هەڵساندن [ف] نگا: هەڵساندن.

**هەڵستانەوە:** هەستانەوە [ف] نگا: هەستانەوە.

**هەڵستاو:** هەڵساو [ف] نگا: هەڵساو.

**هەڵستە:** رابە، راست‌بەوە، هەستە [ف] برخیز.

**هەڵ سڕین:** چڵم هەڵ‌لوُشینەوە لە کەپۆدا [ف] آب بینی را بالا کشیدن.

**هەڵ سکانن:** بەرجوێن‌دان‌و خراوگوتن [ف] دشنام دادن و بدگفتن.

**هەڵســو:** ۱) فەرمـان بە تێ‌ساوین؛ ۲) رابردوی پیاساوین: (مەڵحەمی تێ **هەڵسوم**، قوڕم تێ **هەڵسو**) [ف] ۱) امر به اندودن؛ ۲) ماضی اندودن.

**هەڵسوان:** پیاساوین [ف] اندودن، اندایش.

**هەڵسوُڕ:** ۱) خول‌خواردن؛ ۲) بزوُتن: (خەریکی **هەڵسوُڕ** داسوُڕە) [ف] ۱) چرخش؛ ۲) تحرّك.

**هەڵ سوُڕان:** ۱) سـوُڕان، خـولانەوە؛ ۲) بـزوُتن [ف] ۱) چرخیدن؛ ۲) تحرّك.

**هەڵ سوُڕاندن:** خولدان: (تاولەمەی **هەڵ سوُڕاند**) [ف] چرخانیدن.

**هەڵ سوُڕاو:** ۱) خول‌دراو؛ ۲) برێتی لە مرۆی بەکـارو تێکـۆشــەر: (پیاوێکی **هەڵ سوُڕاوە**) [ف] ۱) چرخیده؛ ۲) کنایه از آدم پرتحرّك.

**هەڵ سوُڕیان:** هەڵ‌سوُڕان [ف] نگا: هەڵ‌سوُڕان.

**هەڵ سوُڕین:** هەڵ‌سوُڕان [ف] نگا: هەڵ سوُڕان.

**هەڵ سوُڕێن:** ۱) کەســێ کە خول بە شتــێ دەدا؛ ۲) برێتــی لە کار پێك‌هێنـەر: (مـام‌حەسـەن کاروبـاری ئاغا **هەڵ دەسوُڕێنێ**) [ف] ۱) چرخاننده؛ ۲) کنایه از گردانندهٔ کار.

**هەڵسوون:** پیاساوین فا اندودن، مالیدن.
**هەڵسە:** هەڵستە فا برخیز.
**هەڵسەنگـان:** ۱) بەراوردکـرنی کێش؛ ۲) بریتی لە ئەزمـوون و نرخ بۆدانان فا ۱) توزین؛ ۲) سنجش، ارزیابی.
**هەڵسەنگـانـدن:** ۱) کێشـان بە تەرازوو؛ ۲) بەراوردکـردن، نرخ بۆدیاری کردن فا ۱) وزن کردن؛ ۲) ارزیابی کردن، سنجیدن.
**هەڵسەنگانن:** هەڵسەنگاندن فا نگا: هەڵسەنگاندن.
**هەڵشاخان:** بەسەردا نەڕاندن: (نازانی چۆن بەسەرمندا **هەڵی شاخاند**) فا بانگ بر سر زدن، برسر کسی فریاد کشیدن.
**هەڵشاخین:** هەڵشاخان فا نگا: هەڵشاخان.
**هەڵشاندن:** ۱) رماندن، روخاندن؛ ۲) هەڵوەشاندن؛ ۳) پاشگەزی؛ ۴) تێکدان فا ۱) ویران کردن، تخریب کردن؛ ۲) ازهم بازکردن؛ ۳) نگا: پاشگەزی؛ ۵) برهم زدن.
**هەڵشتن:** ۱) هشتن، راگرتن؛ ۲) بەجێ هێشتن فا ۱) نگهداشتن؛ ۲) بجاگذاشتن.
**هەڵشلنگاندن:** خۆهەڵکێشانی بەدرۆ فا لاف و گزاف گفتن.
**هەڵشلەپاندن:** هەڵپشاوتن فا مچالەکردن، دردست فشردن.
**هەڵشلەپین:** لەئاودا هەڵبەزینەوە فا جست وخیز درآب.
**هەڵشلیپان:** شلپەلێ هێنان لەئاودا فا با شیرجه در آب انداختن.
**هەڵشلینگاندن:** هەڵشلنگاندن فا لاف، و گزاف، گفتن.
**هەڵشماردن:** دانەدانە باس کردن فا برشمردن.
**هەڵشنگاندن:** هەڵشلنگاندن فا لاف و گزاف گفتن.
**هەڵشۆ:** گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد فا نام دهی است در کردستان که بعثیان ویران کردند.
**هەڵشوولان:** زگچوون فا اسهال.
**هەڵشوولاندن:** گوی شل کردن، زگەشۆرە فا اسهالی ریدن.
**هەڵشێل:** پشاوتن و شێلان فا بهم زدن و جلاندن.
**هەڵشێلان:** هەڵشێل فا نگا: هەڵشێل.
**هەڵشێوان:** ۱) تێکـەڵدران و لێڵدران؛ ۲) دڵ تێکـچـوون فا ۱) بهم خوردن و آشفته شدن؛ ۲) دل بهم آمدن.
**هەڵشێواندن:** ۱) تێکەڵدان و لێڵدان؛ ۲) بوونەهۆی دڵ تێکچوون فا ۱) بهم زدن؛ ۲) دل بهم زدن.
**هەڵشێوانن:** هەڵشێواندن فا نگا: هەڵشێواندن.
**هەڵشێواو:** ۱) تێکەڵدراو؛ ۲) دڵ تێکچو فا ۱) بهم زده، آشفته؛ ۲) دل بهم آمده.
**هەڵشێویاگ:** هەڵشێواو فا نگا: هەڵشێواو.
**هەڵشێویان:** هەڵشێوان فا نگا: هەڵشێوان.
**هەڵفـانـەك:** ۱) بەهەڵکەوت، تۆش بوونی بێ چاوەنۆڕی؛ ۲) پەلکوتانی ناچاری فا ۱) برحسب اتّفاق، بەندرت؛ ۲) دست و پازدن از روی ناچاری.
**هەڵفڕ:** فڕین، باڵ گرتنەوە فا پرواز.
**هەڵفڕان:** هەڵفڕ فا پرواز.

**هەڵفڕاندن:** بوونەهۆی باڵ گرتنەوە فا پروازدادن.
**هەڵفڕانن:** هەڵفڕاندن فا پروازدادن.
**هەڵفرتان:** قوشقی بوون و ڕاکردن فا رمیدن و گریختن.
**هەڵفرتاندن:** وەدەرنان، دەرکردن فا دك کردن، بیرون راندن.
**هەڵفرتانن:** هەڵفرتاندن فا دك کردن.
**هەڵفرتیان:** هەڵفرتان فا رمیدن و گریختن.
**هەڵفڕین:** هەڵفڕان فا پرواز.
**هەڵفڕێن:** شتێ کە باڵدار وەفڕین دەخا فا پروازدهنده.
**هەڵفریوان:** هەڵخەڵەتان فا فریب خوردن.
**هەڵفریواندن:** خاپاندن فا فریب دادن.
**هەڵفریوانن:** هەڵفریواندن فا فریب دادن.
**هەڵفلیقان:** پلیخانەوە فا له و درهم شدن.
**هەڵفلێقان:** هەڵفلیقان، پلیخانەوە فا له و درهم شدن.
**هەڵفلیقاندن:** پلیخاندنەوە فا لەکردن.
**هەڵفلێقانن:** پلیخاندنەوە فا لەکردن.
**هەڵفلێقاو:** فلێقاوە، پلیخاوە فا له و درهم شده.
**هەڵفلێقاوە:** هەڵفلێقاو فا له و درهم شده.
**هەڵفلێقیاگ:** هەڵفلێقاو فا له و درهم شده.
**هەڵفلێقیان:** هەڵفلیقان فا له و درهم شدن.
هەلفۆ: ۱) گەلحۆ، قەلەوی تەمەڵ؛ ۲) هەمەکارەی بێکارە فا ۱) لندهور، چاق تنبل؛ ۲) همه کارهٔ هیچکاره.
**هەلفۆنە:** سەیران و خواردن لە دەشت فا پیك نیك، گردش تفریحی.
**هەڵفیڕان:** بەلەفیڕە گرتن فا اسهال شدن.
**هەڵفیڕاندن:** ریانی گوی شل فا اسهالی ریدن.
**هەڵقا:** ۱) ئالقە، گەو؛ ۲) تێ گیرا فا ۱) حلقه؛ ۲) گیرکرد.
**هەڵقابەستش:** بە جەغز دانیشتن، کۆڕبەستن فا دایرەوار نشستن.
**هەڵقاچان:** بە قەیچی بڕان، هەڵپاچان فا برش با قیچی.
**هەڵقاچین:** هەڵپاچین فا بریدن با قیچی.
**هەڵقان:** تێگیران، گیرکردن: (داوێنم دەوبزمارەی **هەڵقا**) فا به چیزی گیرکردن.
**هەڵقاندن:** کۆڵین، کەندن فا برکندن.
**هەڵقاو:** تێگیراو، گیرخواردو فا درچیزی گیر کرده.
**هەڵقرتـان:** ۱) سەری دار یا گیا یا هەرچی بە مقـەس قرتـان؛ ۲) لێو وەرگێڕان فا ۱) قیچـی برشـدن قسـمـت بالایی گیاه و...؛ ۲) لب برگرداندن از ناخشنودی.
**هەڵقرتاندن:** ۱) سەر بە مقەس قرتاندن؛ ۲) لچ وەرگێڕان فا ۱) بالای هر چیزی را با قیچی بریدن؛ ۲) لب برگرداندن از ناخشنودی.
**هەڵقرتاو:** سەر بە قەیچی بڕاو فا سرقیچی شده، با قیچی بریده شده.
**هەڵقرچان:** ۱) لەسەر ئاگر چۆقین؛ ۲) گنج و چرچ تێ کەوتن لە تینی ئاگر فا ۱) برآتش تفیدن؛ ۲) ترنجیدگی، از شدّت گرما چروك برداشتن.
**هەڵقرچـانـدن:** ۱) لەسـەر ئاگر چۆقاندنی ژۆن؛ ۲) گنجدارکردن، به

چرچ و لۆچ کردن ف ۱) برآتش تفانیدن، ذوب کردن روغن؛ ۲) چین و چروك دادن.

**هەڵ قرچاو:** ۱) چۆقاوی ڕۆن؛ ۲) چرچ و لۆچ بوگ ف ۱) روغن تفیده؛ ۲) ترنجیده، چروکیده.

**هەڵ قرچیاگ:** هەڵ قرچاو ف نگا: هەڵ قرچاو.

**هەڵ قرچیان:** هەڵ قرچان ف نگا: هەڵ قرچان.

**هەڵ قڵیشان:** له سەر تا خوار قەڵشین ف برشکافته‌شدن.

**هەڵ قڵیشاندن:** له سەر تا خوار قەڵشاندن ف برشکافتن.

**هەڵ قڵیشاو:** ئەمسەر ئەوسەر قەڵەشاو ف شکافته شده.

**هەڵقوت:** سەرکێشان بۆ دیتن: (تۆ ئەم **هەڵقوت هەڵقوتەت** لەچیە؟) ف سرکشیدن برای دیدزدن دزدکی.

**هەڵ قوتان:** ۱) هەڵقوت؛ ۲) خۆ هێنانەناو کارێ کە کاری بەسەریەوە نیە ف ۱) سرك کشیدن؛ ۲) فضولی.

**هەڵ قوتـانـدن:** ۱) سەرەتاتکێ کردن؛ ۲) دەمتێوەردان بە ناڕەوا ف ۱) سرك کشیدن؛ ۲) فضولی کردن.

**هەڵ قوتێن:** ۱) سەرەتـاتکێ کەر؛ ۲) دەمتێوەدەری ناڕەوا: (کابرایەکی خۆ تێ‌**هەڵ قوتێنە**) ف ۱) سرك کش؛ ۲) فضول.

**هەڵ قوڕان:** کاری بەفڕ خواردنەوە ف نوشیدن.

**هەڵ قۆڕان:** هەڵ قوڕان ف نوشیدن.

**هەڵ قوڕاندن:** خواردنەوەی یەك سەرە، فڕکردن ف سرکشیدن مایع.

**هەڵ قوڕانن:** هەڵ قوڕاندن ف سرکشیدن مایع.

**هەڵ قۆڕانن:** هەڵ قوڕاندن ف سرکشیدن مایع.

**هەڵ قوڕاو:** فڕکراو ف سرکشیده، مایع یکباره نوشیده شده.

**هەڵ قورت:** ۱) هەڵقوت؛ ۲) لێوەرگێڕان ف ۱) سرك کشیدن؛ ۲) لب برگرداندن.

**هەڵ قورتـان:** ۱) هەڵ قوتـان؛ ۲) وەرگەڕانـەوەی لێو ف ۱) نگـا: هەڵ قوتان؛ ۲) برگشتن لب از ناخشنودی.

**هەڵ قورتـاندن:** ۱) هەڵ قوتاندن؛ ۲) وەرگەڕاندنەوەی لیچ ف ۱) نگا: هەڵ قوتاندن؛ ۲) برگرداندن لب از ناخشنودی، لب ورچیدن.

**هەڵ قورتیان:** هەڵ قوتان ف نگا: هەڵ قوتان.

**هەڵ قورتێن:** هەڵ قوتێن ف نگا: هەڵ قوتێن.

**هەڵ قۆڕیاگ:** هەڵ قوڕاو ف نگا: هەڵ قوڕاو.

**هەڵ قوڕین:** هەڵ قوڕان ف سرکشیدن مایع.

**هەڵ قوڕێن:** فڕکەر ف نوشنده.

**هەڵ قورینجان:** نقورچك ف نیشگون.

**هەڵ قورینجاندن:** ڕەبادان، نقورچك گرتن ف نیشگون گرفتن.

**هەڵ قورینجانن:** هەڵ قورینجاندن ف نیشگون گرفتن.

**هەڵ قورینجاو:** جێگای نقورچك لێ‌گیراو ف جای نیشگون.

**هەڵ قورینجێن:** نقورچك گر ف نیشگون گیرنده.

**هەڵ قورینجێنراو:** هەڵ قورینجاو ف جای نیشگون.

**هەڵ قوڵان:** ۱) بەتـەوژم دەرچـوونی تراو بەرەوبالا: (**هەڵ قوڵانی** ئاوی کانی)؛ ۲) لەنکاو پەیدابوون ف ۱) جوشیدن آب از چشمه یا فوران هر مایعی؛ ۲) ناگهان پدیدارشدن.

**هەڵ قوڵاندن:** بوونەهۆی هەڵ قوڵان ف باعث فوران شدن.

**هەڵ قوڵاو:** ۱) تراوی بەتەوژم بۆ سەرەوە دەرچوگ؛ ۲) لەنکاو پەیدابوگ ف ۱) مایع فوران کرده، جوشیده؛ ۲) ناگهان پدیدار شده.

**هەڵ قوڵتان:** ۱) هەڵ قوڵان؛ ۲) لێو کۆکردنەوە وەك خونچە؛ ۳) لەنکاو پەیدابوون؛ ۴) کوڵێنی تراو لەسەر ئاگر ف ۱) جوشیدن، فوران کردن؛ ۲) لب غنچه کردن؛ ۳) ناگهان پدیدارشدن؛ ۴) جوشیدن مایع برآتش.

**هەڵ قوڵتیان:** هەڵ قوڵتان ف نگا: هەڵ قوڵتان.

**هەڵ قوڵیان:** هەڵ قوڵان ف نگا: هەڵ قوڵان.

**هەڵ قوڵین:** هەڵ قوڵان، هەڵ قوڵتیان ف نگا: هەڵ قوڵان.

**هەڵ قوڵیو:** هەڵ قوڵاو ف نگا: هەڵ قوڵاو.

**هەڵقون:** قنەکردن، ڕۆیشتنی هێندێك باڵدار ف ورجه.

**هەڵقون‌هەڵقون:** قنەکردن، بە قنە ڕۆیشتن ف ورجه‌ورجه.

**هەڵ قونیان:** لەپڕ بەرچاوهاتن ف یکهو پدیدار شدن.

**هەڵ قونین:** هەڵ قونیان ف یکهو پدیدارشدن.

**هەڵقە:** ۱) ئاڵقە، گەو؛ ۲) فێڵ، گزی ف ۱) حلقه؛ ۲) حیله، نارو.

**هەڵقەباز:** ۱) جادوگەر؛ ۲) فێڵباز ف ۱) جادوگر؛ ۲) حقّه‌باز.

**هەڵقەبەگوش:** نۆکەری ئەمەگدار ف نوکرحلقه بەگوش.

**هەڵقەبەگوێ:** هەڵقەبەگوش ف غلام حلقه‌بەگوش، نوکر مخلص.

**هەڵقەتڕان:** لێك کۆبوونەوەی هەتیومەتیو ف گرد همآیی اوباش.

**هەڵقەتڕانێ:** هەڵقەتڕان ف تجمّع اوباش.

**هەڵقەتیز:** ئاڵقەتیز ف گیاهی است دارای شیرهٔ مُسهل.

**هەڵقەتیزان:** کۆمەڵی جەفەنگ‌بازان ف مجلس بذله‌گویان.

**هەڵقەتیزانێ:** قسەی گەپ و گاڵتە پێکەوە کردن ف شوخی و هزل با هم گفتن.

**هەڵقەڵك:** هانکەهانکی سەگ، هەلکەڵك ف هِن هِن سگ.

**هەڵ قەمچان:** هەڵ قرچان، ترنجان ف از شدّت گرما چروك برداشتن.

**هەڵقەن:** کەن، زیندەوەرێ کە ئەکۆڵێ ف کاونده.

**هەڵقەناو:** کەندراو ف کنده‌شده.

**هەڵ قەندار:** جۆرێ تفەنگی ڕەشۆکی کە قەدیم هەبو ف نوعی تفنگ قدیمی.

**هەڵ قەندراو:** کەندراو ف کنده‌شده.

**هەڵ قەندن:** کەندن، کۆڵین ف کندن، برکندن.

**هەڵ قەندنەوە:** ۱) دیسان هەڵ قەندن؛ ۲) بەبنەوە دەرهێنانی گیاو ڕوەك لە زەوی: (ئـەوڕو هەرەوەزی چەوەنـدەر**هـەڵ قەنـدنـەوەیە**) ف ۱) بازبرکندن؛ ۲) از ریشه‌کندن گیاه و محصولات کشاورزی.

**هەڵ قەننەوە:** هەڵ قەندنەوە ف نگا: هەڵ قەندنەوە.

**هەڵك:** تیزکردن بە کەسێ ف مسخره، تمسخر.

**هەڵ کاڵان:** بە ئێرەیی باس یا تماشاکردن ف حسودانه گفتن یا نگاه کردن.

**هەڵ کاڵیان:** هەڵ کاڵان ف نگا: هەڵ کاڵان.

**هەڵ کاڵین:** هەڵ کاڵان ف نگا: هەڵ کاڵان.

**هەڵ کران:** ۱) پێ بوُنی ئاگر؛ ۲) هاڵاندنی داو لە شتێ: (گلۆڵەکە **هەڵکرا**)؛ ۳) رابواردنی ژیان: (**هەڵ کران** دەگەڵ تۆ گرانە)؛ ۴) بەرەژۆربرانی داوێن و قۆڵ: (خۆت **هەڵکە**) ف ۱) افروخته شدن؛ ۲) پیچیده‌شدن نخ بر چیزی؛ ۳) گذران زندگی؛ ۴) ورمالیده‌شدن.

**هەڵ کڕان:** ۱) بە چنك و نینۆك کڕاندن؛ ۲) خوراندن: (خۆ **هەڵ مەکرێنە**) ف ۱) حك کردن با ناخن و تیغ؛ ۲) خاراندن.

**هەڵ کڕاندن:** ۱) بە نینۆك و بە شتی تیژ شتێ لە شتێ جیاکردنەوە؛ ۲) خۆخوراندنی بەتەوژم ف ۱) حك کردن؛ ۲) خاراندن شدید.

**هەڵ کڕانن:** هەڵ کڕاندن ف نگا: هەڵ کڕاندن.

**هەڵ کراو:** ۱) داو لە شتێ پێچراو؛ ۲) داوێن و قۆڵی بەرەژۆربراو: (دەلینگی **هەڵ کراوە**) ف ۱) پیچیده؛ ۲) ورمالیده.

**هەڵ کڕاو:** ۱) بە نینۆك کڕاو؛ ۲) خورێندراو، خوراو ف ۱) حك شده؛ ۲) خارانده.

**هەڵ کرچان:** چرچ و لۆچ بوُن ف ترنجیدگی، چین و چروك برداشتن.

**هەڵ کرچاندن:** چرچ و لۆچ کردن ف ترنجیدن، چین و چروك کردن.

**هەڵ کرچاو:** چرچ و لۆچ ف چین خورده.

**هەڵ کرچیان:** هەڵ کرچان ف نگا: هەڵ کرچان.

**هەڵ کرچین:** هەڵ کرچان ف نگا: هەڵ کرچان.

**هەڵکرد:** گوزەران و ڕابواردن ف گذران زندگی.

**هەڵ کردن:** ۱) گوزەران کردن؛ ۲) دەلینگ و داوێن و قۆل بەرەژۆربردن؛ ۳) ئاگرپێ کردن ف ۱) زندگی را گذراندن؛ ۲) ورمالیدن؛ ۳) افروختن.

**هەڵ کردنەسەر:** هێرش بۆ بردن ف حملەور شدن.

**هەڵ کرن:** ۱) هەڵ کردن، گوزەران کردن؛ ۲) تواندنەوە؛ ۳) هانەدان، هەڵخڕاندن ف ۱) زندگی را گذراندن؛ ۲) ذوب کردن؛ ۳) برانگیختن.

**هەڵ کڕۆزان:** تۆزێ بە ئاگر سوُتان ف سوختن سطحی.

**هەڵ کڕۆزاندن:** کەمێ بە ئاگر سوُتاندنی پێست و گۆشت ف سوزانیدن سطحی.

**هەڵ کڕۆزاو:** کەمێ سوُتاو بە ئاگر ف سوختهٔ سطحی.

**هەڵ کری:** ۱) پێکراو، داگرساو؛ ۲) دنەدراو؛ ۳) تاواوە ف ۱) افروخته؛ ۲) برانگیخته؛ ۳) ذوب شده.

**هەڵ کریاگ:** پێچیاوی داو لە شتێ، گلۆڵەکراو ف نخ گلولەشده.

**هەڵ کریان:** گلۆڵەکردن ف گلولەکردن نخ.

**هەڵ کْز:** سوُرەوەبوُنی گۆشت لەسەر ئاگر ف سرخ شدن گوشت بر آتش.

**هەڵ کزان:** هەڵ کْز ف نگا: هەڵ کْز.

**هەڵ کزاندن:** سوُرەوەکردنی گۆشت لەسەر ئاگر ف سرخ کردن گوشت در تابه.

**هەڵ کزانن:** هەڵ کزاندن ف نگا: هەڵ کزاندن.

**هەڵ کزاو:** سوُرەوەکراوی ڕەقەوەبوُگ ف سرخ شدهٔ سفت شده.

**هەڵ کزیان:** هەڵ کْز، هەڵ کزان ف سرخ شدن گوشت بر آتش.

**هەڵ کزین:** هەڵ کْز، هەڵ کزان ف سرخ شدن گوشت بر آتش.

**هەڵکْش:** ۱) بەرەژۆرچوُن: (بۆ کێو **هەڵ کشان**)؛ ۲) دەرکێشانی خەنجەر و شیر؛ ۳) هاتنەپێشی ئاوی دەریا ف ۱) روبەبالا رفتن؛ ۲) آختگی تیغ؛ ۳) مدّ آب دریا.

**هەڵ کشان:** هەڵکْش ف نگا: هەڵکْش.

**هەڵ کشاندن:** ۱) بەرەوسەرکێشان؛ ۲) دەرکێشانی خەنجەر و شیر؛ ۳) دەرهاوردن ف ۱) به بالا کشیدن؛ ۲) برکشیدن، آختن؛ ۳) بیرون آوردن.

**هەڵ کشانن:** هەڵ کشاندن ف نگا: هەڵ کشاندن.

**هەڵ کشاو:** ۱) بەرەوباڵا ڕۆیشتو؛ ۲) بۆ سەرەوە کێشراو؛ ۳) دەرکێشراو؛ ۴) نیشانەی دەنگ‌درێژکردن لەسەر پیتی نوسراو، مەددە ف ۱) روبەبالا رفته؛ ۲) بەبالا کشیده شده؛ ۳) برکشیده، آخته؛ ۴) علامت مدّ برحروف.

**هەڵ کشاوە:** نیشانەی دەنگ‌درێژکردنەوە لەسەر پیت، مەددە ف علامت مدّ بر حروف.

**هەڵ کشاوی:** هەڵ کشاوە ف علامت مدّ بر حروف.

**هەڵکشە:** ۱) هاتنەپێشەوەی ئاوی کەناراو؛ ۲) بەرەوژۆرکشانەوە؛ ۳) بەرەوژۆرچوُن: (بوُکامە **هەڵکشە**و داکشە دەزانێ) ف ۱) مدّ آب دریا؛ ۲) برگشت روبه بالا؛ ۳) روبه بالارفتن.

**هەڵ کشی:** بەرەژۆر چو ف روبه بالا رفت.

**هەڵ کشێ:** بەرەژۆر بچۆ ف روبەبالا برو.

**هەڵ کشیان:** هەڵ کشان ف نگا: هەڵ کشان.

**هەڵ کشین:** هەڵ کشان ف نگا: هەڵ کشان.

**هەڵ کشیو:** ۱) بەرەوژۆر ڕۆیشتو؛ ۲) بەرەوژۆر ڕاکێشراو ف ۱) روبەبالا رفته؛ ۲) برکشیده.

**هەڵ کفان:** ۱) هەڵچوُن لەسەر ئاگر و کەف لێ ڕژان؛ ۲) هەڵازنانی پێست لە زیپکە؛ ۳) ئەستوُربوُن لە باکردن؛ ۴) ترشانی هەڤیر؛ ۵) هەڵمسان و نزیك تەقینەوەی باروُت ف ۱) لبریز شدن کف از دیگ بر آتش؛ ۲) پرجوش شدن پوست؛ ۳) پف کردن و آماسیدن؛ ۴) ترشیدن خمیر؛ ۵) برآمدن و نزدیك به انفجاربودن باروت.

**هەڵ کفاندن:** بە ئەسکوێ تێکەڵدانی چێشتێ کە هەڵدەچێ ف با ملاقه بهم زدن آش در حال جوش.

**هەڵ کفیان:** هەڵ کفان ف نگا: هەڵ کفان.

**هەڵ کفین:** هەڵ کفان ف نگا: هەڵ کفان.

**هەڵ کلاش:** بە نینۆك کڕان ف خاراندن و حك کردن با ناخن.

**هەڵ کلاشیان:** هەڵ کلاش ف نگا: هەڵ کلاش.

**هەڵ کلاشین:** هەڵ کلاش ف نگا: هەڵ کلاش.

**هەڵ کنیاگ:** هەڵقەناو ف برکنده.

**هەڵکوت:** بەپەلەو بەغار ف با شتاب و دو.

**هەڵ کوتان:** پەلامار ف یورش.

**هەڵ کوتاندن:** ۱) پەلاماردان؛ ۲) دەرکێشانی بزمار... ف ۱) یورش

کردن؛ ٢) برکندن میخ و ....

**هەڵ کوتانەسەر:** پەلاماربۆبردن، هەڵ کردنەسەر ف یورش بردن بر کسی.

**هەڵ کوتن:** پەسنددان، پێداهەڵدان ف ستودن.

**هەڵ کوتـــوك:** جۆرێ داوەتو هەڵپـــەرکێی کوردانـە لە کوردستـانی بەردەستی ترکان ف نوعی رقص دستەجمعی.

**هەڵکوتهەڵکوت:** بەغارو پەلەپەل ف بادویدن و شتاب.

**هەڵ کوتیان:** هەڵ کوتان ف یورش.

**هەڵ کورمان:** ١) کزکردنوخۆمات کردنی باڵدار؛ ٢) برێتی لەکز کردن لە لاپەڕو بن دیواران ف ١) کزکردن پرنده؛ ٢) کنایەاز انزوا و کزکردن در گوشەو کنار.

**هەڵ کورمـاو:** ١) باڵـداری کزکـردو؛ ٢) برێتی لە مروی گۆشەگرتو و لاپەڕ ف ١) پرندهٔ کز کرده؛ ٢) کنایه از آدم گوشه‌گیر و منزوی.

**هەڵ کورۆزان:** هەڵ کرۆزان ف سوختن سطحی.

**هەڵ کورۆزاندن:** هەڵ کرۆزاندن ف سوزاندن سطحی.

**هەڵ کورۆزانن:** هەڵ کرۆزاندن ف سوزاندن سطحی.

**هەڵ کورۆزاو:** هەڵ کرۆزاو ف سوختهٔ سطحی.

**هەڵ کوروشمان:** هەڵ کورمان ف نگا: هەڵ کورمان.

**هەڵ کوروشماو:** هەڵ کورماو ف نگا: هەڵ کورماو.

**هەڵ کوشان:** کوشین بەتوندی ف فشردن شدید.

**هەڵ کوشین:** هەڵ کوشان ف فشردن شدید.

**هەڵ کولۆش:** هەڵقەن ف کاونده، کننده.

**هەڵ کولۆشان:** هەڵقەندن ف برکندن، کندن.

**هەڵ کولۆشانن:** هەڵ کولۆشان ف برکندن، کندن.

**هەڵ کولۆشیان:** هەڵ کولۆشان ف برکندن.

**هەڵ کولۆشین:** هەڵ کولۆشان ف برکندن.

**هەڵ کۆڵـــین:** ١) دانـــەوەی زەمـــین؛ ٢) ناوەڕێـــانـــی هەرشـــتێ: (دارهـــەڵ کۆڵین، ددانهەڵ کۆڵین) ف ١) کنـدن زمین؛ ٢) خالی کردن درون اشیاء

**هەڵ کوڵین:** هەڵ کۆڵین ف نگا: هەڵ کۆڵین.

**هەڵکە:** دۆڵچە، سەتڵی چەرم ف دلو چرمین.

**هەڵکـە:** ١) گوزەران بکـە؛ ٢) بەن بکـە بە گلۆڵـە؛ ٣) داگرسێنە؛ ٤) بەرەژوربەرە: (قوڵت هەڵکە) ف صیغهٔ امر «هەڵ کردن».

**هەڵ کەتن:** ١) مانەوە لە شوێن خۆ؛ ٢) بەرزبونەوەو بەرەژورچون ف ١) درجای خود ماندن؛ ٢) بەبالا رفتن.

**هەڵکـــەر:** ١) داگیرسێن؛ ٢) گوزەرانکەر؛ ٣) بەرەژوربـــەری قوڵو دەلینگو دامێن؛ ٤) بەن بەگلۆڵەکەر ف اسم فاعل «هەڵ کردن».

**هەڵ کەفت:** پێشهاتی بەدەگمەن ف اتّفاق، پیشامد نادر.

**هەڵ کەفتگ:** ١) بەرکەتی، بلیمەت؛ ٢) پێشهاتوی بێ ئاگاداری ف ١) نابغه؛ ٢) اتّفاق غیرمنتظره.

**هەڵ کەفـتن:** ١) پێشهاتی بەدەگمـەن؛ ٢) ناو لەقـورگ گیران؛ ٣) سەرەنگرێبردن؛ ٤) رەتبردن؛ ٥) لەبەرچاوکەوتن؛ ٦) کەمونەبون ف ١) رویداد اتّفاقی؛ ٢) آب درگلو گیرکردن؛ ٣) سکندری خوردن؛ ٤) تلوخوردن؛ ٥) از چشم افتادن، منفورشدن؛ ٦) نبوغ.

**هەڵ کەفتە:** بێوێنەو بەرکەتی ف نابغه.

**هەڵ کەفتی:** هەڵ کەفتە ف نابغه.

**هەڵکەڵك:** ١) هەناسەبڕکێ لە ماندویی‌و لە نەخۆشی؛ ٢) هانکە هانکی سەگی مانـدو ف ١) تنگی نفس از خستگی یا بیمـاری؛ ٢) هِنِ هِنِ سگ خسته.

**هەڵکەن:** هەلقەن ف کاونده.

**هەڵ کەندراو:** هەڵ قەناو ف کنده‌شده.

**هەڵ کەنراو:** هەڵ قەناو ف کنده‌شده.

**هەڵ کەندن:** هەڵ قەندن ف کندن.

**هەڵ کەنن:** هەڵ کەندن ف کندن.

**هەڵ کەنیاگ:** هەڵ قەناو ف کنده شده.

**هەڵکەوت:** ١) هەڵکەفت؛ ٢) دەرفەت: (هەر بۆم **هەڵ کەوت** وەدیم) ف ١) پیشامد نادر؛ ٢) فرصت.

**هەڵ کەوتـــن:** ١) هەڵ کەفـتـن؛ ٢) مانـــەوە؛ ٣) بەرەژورچـــون؛ ٤) تەرەقی کردن؛ ٥) دەرفـەت ف ١) نگا: هەڵ کەفتن؛ ٢) بازماندن؛ ٣) بەبالارفتن؛ ٤) ترقّی کردن؛ ٥) فرصت.

**هەڵ کەوتو:** هەڵ کەفتە ف نابغه.

**هەڵ کەوتە:** هەڵ کەفتە ف نابغه.

**هەڵکەهەڵك:** پشوسواری‌و مرخەمرخ ف هِنِ‌هِن نفس تنگی.

**هەڵ کێشـان:** ١) دەرکێشـان؛ ٢) بوسـەرەوە کێشان: (**هەڵی کێشە** با بێتـەسـەر)؛ ٣) قوتدانـەوەی نەفەس: (هەناسەی **هەڵ کێشا**)؛ ٤) تاریف کردن: (خـۆ **هەڵ مەکێشە**) ف ١) بیرون کشیدن؛ ٢) بەبالا کشیدن؛ ٣) نفس کشیدن؛ ٤) تعریف کردن، مدح کردن.

**هەڵ کێشانن:** هەڵ کێشان ف نگا: هەڵ کێشان.

**هەڵ کێشیان:** هەڵ کێشان ف نگا: هەڵ کێشان.

**هەڵگ:** کۆشش‌و تەقالای زۆر ف تلاش زیاد.

**هەڵگـر:** ١) کەسێ کە سەنگینی بەرزدەکاتەوەو ڕای‌دەگرێ؛ ٢) ڕاگوێز؛ ٣) بڵندڕاگر: (ئەسپی کلك **هەڵگر** باشە) ف ١) بردارنده؛ ٢) حامل؛ ٣) بلندنگاه دارنده.

**هەڵ گڕا:** ١) گڕی بەرزەوەبـو؛ ٢) سوتـا بە گڕ؛ ٣) لەش هەمـو بۆ بە زیپکەو دومەڵ ف ١) مشتعل شد؛ ٢) با آتش سوخت؛ ٣) همهٔ پوست را جوش و دُمَل فراگرفت.

**هەڵ گڕان:** ١) گڕ بـەرزەوەبون؛ ٢) سوتان بە گڕ؛ ٣) لەش‌هەڵازنان بە کوان‌و زیپکـە ف ١) افـروختن؛ ٢) با آتش سوختن؛ ٣) فراگرفتن جوش همهٔ بدن را.

**هەڵ گراو:** ١) ڕاگیراو: (شتێکی تۆ لای منە **هەڵ گراوە**)؛ ٢) ژنی ڕفێنراو ف ١) نگهداری شده؛ ٢) زن ربوده شده.

**هەڵ گڕاو:** بەرکاری هەڵ گڕان ف اسم مفعول «هەڵ گڕان».

**هەڵ گرتن:** ١) لاگرتن: (سـەری ئەم سندوقە **هەڵگرە**)؛ ٢) قبوڵ‌کردن: (خـوا **هەڵ ناگـرێ**، دڵم **هەڵی ناگـرێ**)؛ ٣) بەرزەوە کردن‌و ڕاگرتن؛

(ئەمە لە زەوی **هەڵگرە**)؛ ۴) شاردنەوە: (ئەم پارەیەم بۆ **هەڵگرە**)؛ ۵) رەواندنی ژن؛ ۶) جوێن‌دانی زۆر: (**هەڵی گرت ئەمما هەڵ گرتن**)؛ ۷) غاردانی ئەسپ بەسوارەوە بێ ڕاوەستاندن: (ئـەسپ **هەڵی گرتم**، فێرەهـەڵ **گرتنـە**)؛ ۸) هەڵبژاردن، تایبەتی خۆ کردن: (لەو کەوشانە جوتێکی **هەڵگـرە**)؛ ۹) هەڵێنانی لاقی نەخۆش لە ڕۆیشتنا: (گایەکە پاشـوی **هەڵ گرتـوە**) [ف] ۱) سرپـوش برداشتن؛ ۲) روادیدن؛ ۳) برداشتن، بلنـدکردن؛ ۴) نگهداری کردن؛ ۵) ربودن زن؛ ۶) دشنام بسیار به کسی دادن؛ ۷) دویدن و از کنترل خارج شدن اسب با سوار؛ ۸) انتخـاب کردن، بەخود اختصاص دادن؛ ۹) بلندکردن و بر زمین نگذاشتن پای لنگ.

**هەڵ گرتنـــەوە:** ۱) پەرژو بڵاو کۆکـــردنـەوە؛ ۲) سزا وەرگرتن: (ئـەوا **هەڵمـان گرتەوە**)؛ ۳) قبوڵ‌کردنەوەی بێچو لەلایەن دایکی نەبانەوە: (بێچوەکەی **هەڵ گرتەوە**)؛ ۴) سڕینەوەی نوسراو: (ئەم دو کەلیمەی لێ **هەڵ گرەوە**)؛ ۵) چنینەوەی گەوی بەربوگ لە کردا: (گۆرەویەکەم دوگەوی بەربیـــو **هەڵم گرتـەوە**) [ف] ۱) از زمین چیدن پراکنـده؛ ۲) پاداش گرفتن؛ ۳) دوبـاره پذیرفتن بچـه توسط مادرش؛ ۴) ستردن نوشته؛ ۵) بافتن دانەهای دررفتهٔ بافتنی.

**هەڵ گرتەیی:** لە زەوی بەرزتر ڕۆیشتنی کەلا [ف] بالاتر از زمین رفتن تیله.

**هەڵ گرسان:** گڕ لێ‌پەیدابوون [ف] افروختگی.

**هەڵ گرساندن:** گڕ لێ‌پەیداکردن [ف] افروختن.

**هەڵ گرسانن:** هەڵ‌گرساندن [ف] افروختن.

**هەڵ گرسیاو:** هەڵ‌کراو، ئاگری پێ‌بوگ [ف] افروخته.

**هەڵ گلۆفان:** ۱) هەڵ‌کوشین؛ ۲) لەدەستا گوشین و فلیقاندنەوە [ف] ۱) فشردن؛ ۲) دردست مچاله‌کردن.

**هەڵ گلۆفتن:** هەڵ‌گلۆفان [ف] نگا: هەڵ‌گلۆفان.

**هەڵ گلۆفین:** هەڵ‌گلۆفان [ف] نگا: هەڵ‌گلۆفان.

**هەڵ گوازتـن:** ۱) بەرەوژوور ڕاگوێزان: (ئـــاوێ لە بیر **هەڵ گوازە**)؛ ۲) هەڵ‌بواردن [ف] ۱) بەبالا انتقال دادن؛ ۲) گذشتن از.

**هەڵ گواستن:** هەڵ‌گوازتن [ف] نگا: هەڵ‌گوازتن.

**هەڵ گوتن:** پێداهەڵدان [ف] ستودن.

**هەڵ گۆزان:** بەرەوژوور گوازتنەوە [ف] بەبالا انتقال دادن.

**هەڵ گوزان:** هەڵ‌تۆزان [ف] جفتک‌پرانی و رمیدن.

**هەڵ گوزانن:** هەڵ‌تۆزاندن [ف] جفتک پراندن و رمیدن.

**هەڵ گۆزین:** هەڵ‌گۆزان [ف] به بالا منتقل کردن.

**هەڵ گوستن:** ئاوهەڵ‌کێشان [ف] بالاکشیدن آب.

**هەڵ گۆستن:** راگوێزان [ف] انتقال دادن.

**هەڵ گوسیار:** وتـەیەکە بۆ بانگ‌کردنی گەمەکەر واتا: کێ دێ با بێ [ف] ندا برای شرکت بازیگران در بازی.

**هەڵگوش:** هەڵکوش [ف] فشردن و مچاله‌کردن.

**هەڵ گوشان:** هەڵ‌کوشین، کوشین بەتوندی [ف] فشردن شدید.

**هەڵ گوشین:** هەڵ‌گوشان، هەڵ‌کوشین [ف] فشردن با فشار زیاد.

**هەڵ گولۆفان:** هەڵ‌گلۆفان [ف] نگا: هەڵ‌گلۆفان.

**هەڵ گولۆفتن:** هەڵ‌گلۆفان [ف] نگا: هەڵ‌گلۆفان.

**هەڵ گولۆفین:** هەڵ‌گلۆفان [ف] نگا: هەڵ‌گلۆفان.

**هەڵ گەڕان:** ۱) هەڵچـوون بە دارو بڵنـدیدا: (بـە دار **هەڵگەڕا**، بە چیا **هەڵگـەڕا**)؛ ۲) ڕۆیشتنی جانـەوەر بە لەشدا: (ئەسپێم پێ **هەڵگەڕا**، دوپشکێکم پێ **هەڵگەڕا**)؛ ۳) خراپ‌بوونی شیر لە کوڵاندا: (شیرەکە **هەڵ گەڕاوە**) [ف] ۱) بالا رفتن از بلنـــدی؛ ۲) عبـور حشـره بر تن جاندار دیگر؛ ۳) بریدن و خراب شدن شیر هنگام جوشیدن.

**هەڵ گەڕانـدن:** ۱) وەرگەڕانـدن؛ ۲) بەرەوژوور سووڕانـدن؛ ۳) بەرەوژوور گەیانـدن: (پـەز **هەڵ گەڕێنـە** چیا) [ف] ۱) واژگون کردن؛ ۲) بەبالا چرخاندن؛ ۳) بەبالا رساندن.

**هەڵ گەرانـدنـەوە:** ۱) وەرگێڕان؛ ۲) بریتی لە پەژیوان‌کردنەوە [ف] ۱) زیرورو کردن؛ ۲) کنایه از پشیمان کردن.

**هەڵ گەڕاننەوە:** هەڵ‌گەڕاندنەوە [ف] نگا: هەڵ‌گەڕاندنەوە.

**هەڵ گەڕانـەوە:** ۱) ژێرورووبـوون؛ ۲) بریتی لە پەشیمـان‌بوونەوە [ف] ۱) زیرورو شدن؛ ۲) کنایه از پشیمان شدن.

**هەڵ گەڕاو:** ۱) شیری بزڕکاو؛ ۲) پێستی پڕ لە دومەڵ و زیپك، داگەڕاو: (لەشی بە زیپکان **هەڵ گەڕاوە**)؛ ۳) داقناو بە ئەسپێ و زیندەوەر [ف] ۱) شیر بریده؛ ۲) پوست پر از دمل و جوش؛ ۳) پوست پراز حشره.

**هەڵ گەڕاوە:** ژێرووژوکراو [ف] زیرورشده.

**هەڵ گەڕیاگەوە:** لە دۆستی پەشیمان [ف] روگردان، از دوستی پشیمان.

**هەڵ گەڕیانەوە:** هەڵ‌گەڕانەوە [ف] نگا: هەڵ‌گەڕانەوە.

**هەڵگێڕ:** ۱) گوازتنـەوە: (ئەم‌هەمو **هەڵگێڕوەرگێڕەی** بۆ پێدەکەی)؛ ۲) ژێرووژوکردن؛ ۳) وەرگەڕێن [ف] ۱) انتقال دادن؛ ۲) زیرورشدن؛ ۳) زیرورکننده.

**هەڵ گیران:** ۱) راگیران؛ ۲) شاردرانەوە؛ ۲) رفانی ژن [ف] ۱) نگهداری شدن؛ ۲) وسیلهٔ کسی پنهان شدن؛ ۳) ربوده‌شدن زن.

**هەڵ گێڕان:** وەرگێڕان، نخوون و سەروژێرکردن [ف] زیرورکردن.

**هەڵ گێڕانەوە:** ۱) وەرگەڕاندن؛ ۲) پەشیمان‌کردنەوە [ف] ۱) برگرداندن، زیرورکردن؛ ۲) پشیمان کردن.

**هەڵ گیراو:** ۱) داندراو بۆ ئاگالێ‌بوون؛ ۲) شاردراوە؛ ۳) ژنی رەوێنراو؛ ۴) بەرزەوەکـراو [ف] ۱) نگهـداری شده؛ ۲) پنهان کرده؛ ۳) زن ربوده شده؛ ۴) برداشته شده.

**هەڵگێڕوەرگێڕ:** ۱) ژێرووژوکـــردن؛ ۲) بریتی لە جوڵانـــەوە: (پیر بوە **هەڵگێڕوەرگێڕی** پێ‌ناکرێ) [ف] ۱) زیرورکردن؛ ۲) کنایه از جنبش و تحرّك.

**هەڵگێڕوەڵگێڕ:** هەڵگێڕوەرگێڕ [ف] نگا: هەڵگێڕوەرگێڕ.

**هەڵ گێڕەوە:** وەرگەڕێن [ف] زیرورکننده.

**هەڵ گیریاگ:** هەڵ‌گیراو [ف] نگا: هەڵ‌گیراو.

**هەڵ گیریان:** هەڵ‌گیران [ف] نگا: هەڵ‌گیران.

**هەڵلا:** ۱) هەراو زەنازەنا؛ ۲) وتەی سەیرمان و پەسندکردن: (**هەڵلا** لەو جوانـــیە)؛ ۳) بەرەوژوور؛ ۴) لرفـــەی خواردن؛ ۵) گەرمـــی داوەت و

زەماوەند فا ١) غوغا و هنگامه؛ ٢) حرف تعجّب؛ ٣) رو به بالا؛ ۴) سر وصدای خوردن؛ ۵) شلوغی جشن و پایکوبی.

**هەڵلابردن:** بەرەژوور بردن فا رو بەبالا بردن.

**هەڵلاچوون:** بەرەژوورچوون، پێ هەڵگەڕان: (بەدار **هەڵلاچو**) فا بالا رفتن.

**هەڵـلاداد:** لەبەین چوون، نەمان: (ماڵەکەیان **هەڵلاداد** کرد) فا ازبین رفتن، نابودشدن.

**هەڵلادۆشە:** حندرحۆ فا آلاکلنگ.

**هەڵلاقوچکە:** لەسەریەك هەڵچنراوی بڵندەوەبووگ فا برهم چیدهٔ بلندشده.

**هەڵلاقوچە:** هەڵلاقوچکە فا برهم چیدهٔ بلندشده.

**هەڵلامە:** هەلامە، هەلاو فا گیاهی است وحشی و خوراکی.

**هەڵلاهەڵلا:** ١) وتەی زۆر لێ خۆش هاتن: (**هەڵلاهەڵلا** چەند شەوێکی خۆش بو)؛ ٢) هەراو جەقـە، هەراهەرا، زەنازەنا فا ١) علامت بسیار خوش آمدن از چیزی؛ ٢) جنجال و غوغا.

**هەڵ لوشـــان:** دەم‌پێوە نـــان‌و خستنـــەنـاو گەرو بە مژین: (هـەژدیهـا هەڵی لوشی، ئەو گشت شۆربایەی **هەڵ لوشی**) فا سرکشیدن مایع.

**هەڵ لوشین:** هەڵ لوشان فا نگا: هەڵ لوشان.

**هەڵلە:** ١) رەت، خلیسکان؛ ٢) هەڵە، خەتا فا ١) لغزش؛ ٢) خطا، سهو.

**هەڵ لەرزین:** زۆر لەرزین لەسەرمان فا لرزیدن زیاد از سرما.

**هەڵلەق مەڵلەق:** قسەی هاتەران پاتەران فا حرف مفت و بی سر وته.

**هەلم:** ١) هەناسە؛ ٢) بۆن فا ١) نفس، بازدم؛ ٢) بو.

**هەلْم:** ١) دەرفەتی من؛ ٢) نۆرەی من، هەلی من فا ١) فرصت من؛ ٢) نوبت من.

**هەڵم:** بۆخ فا بخار.

**هەڵمات:** کەلا، مەڕمەڕ، تیلە فا تیلە.

**هەڵماتان:** کەلایێن فا تیله‌بازی.

**هەڵماتانێ:** هەڵماتان فا تیله‌بازی.

**هەڵماتێن:** هەڵماتان فا تیله‌بازی.

**هەڵماس:** ئەڵماس فا الماس.

**هەڵ ماسیان:** هەڵامسان فا آماسیدن.

**هەڵ ماسین:** هەڵامسان فا آماسیدن.

**هەڵ ماڵان:** ١) بەرەوژووربـردنی دەلینـگ‌و قۆڵ: (**قۆڵی هەڵماڵی**)؛ ٢) خزین‌و لێ بوونـــەوە: (گوریســـەکـــە **هەڵ ماڵاوە**، پەتـــەکـــەی لێ **هەڵ ماڵاوە**)؛ ٣) بڕێتـــی لە شەرم‌شکـــان: (**ڕووهـــەڵ ماڵان**) فا ١) ورمالیدن آستین و پاچهٔ شلوار؛ ٢) خزیدن و بازشدن باربند و...؛ ٣) کنایه از پر روشدن.

**هەڵ ماڵاو:** ١) قەفی گوریسی داخزاو؛ ٢) هەڵکراوی قۆڵ‌و دەلینگ؛ ٣) شەرم‌شکـاو: (**ڕووهـەڵمـاڵاو**) فا ١) حلقـهٔ رسن باربند که خزیده و بازشده است؛ ٢) آستین و پاچهٔ ورمالیده؛ ٣) پر روشده.

**هەڵ ماڵدراو:** هەڵ ماڵاو فا نگا: هەڵ ماڵاو.

**هەڵ ماڵران:** هەڵ ماڵان فا نگا: هەڵ ماڵان.

**هەڵ ماڵراو:** هەڵ ماڵاو فا نگا: هەڵ ماڵاو.

**هەڵ ماڵیان:** هەڵ ماڵان فا نگا: هەڵ ماڵان.

**هەڵ ماڵین:** ١) هەڵ کردنی قۆڵ‌و دەلینگ؛ ٢) لێ خزاندنی گرێ‌و قوڵفە؛ ٣) بۆ بالا هەڵ کێشان: (خوڵی تەنوورەکە **هەڵماڵە**) فا ١) ورمالیدن؛ ٢) لغزانیدن بند و رسن وبازکردن آن؛ ٣) بەبالا برکشیدن.

**هەڵماو:** ئاوێ کە لە بۆخەوە پەیدادەبێ فا آب مقطّر.

**هەڵ مرویستن:** هەڵ مژین فا برمکیدن.

**هەڵ مرویسین:** هەڵ مژین فا برمکیدن.

**هەڵ مژاردن:** هەڵ بژاردن فا برگزیدن.

**هەڵ مژان:** ١) لە ڕێگـەی لوتـەوە بردنەناو دەروون: (هەوا **هەڵمژە**، بۆنی **هەڵمـــژە**)؛ ٢) لەنـاودا خوسـان، ئاو کێشـانـەنـاوخـۆ: (لـۆکـە ئاو **هەڵ دەمژێ**)؛ ٣) مژین، هەڵ کێشانی تراو بۆ ناودەم فا ١) بوکشیدن؛ ٢) جذب رطوبت؛ ٣) مکیدن.

**هەڵ مژتن:** هەڵ مژان فا نگا: هەڵ مژان.

**هەڵمژەك:** ئامرازی ئاوبەردانە سەر ئاودەس فا سیفون.

**هەڵ مژین:** هەڵ مژان فا نگا: هەڵ مژان.

**هەڵ مسان:** هەڵامسان فا آماسیدن.

**هەڵ مساندن:** هەڵامساندن فا متورّم کردن.

**هەڵ مساو:** هەڵامساو فا آماسیده.

**هەڵ مشتن:** هەڵ مژین، هەڵ مژان فا نگا: هەڵ مژان.

**هەڵ ملیسیان:** لێو لێ توندکردن‌و هەڵ مژین فا لب بر چیزی فشردن و مکیدن.

**هەڵ ملیسین:** هەڵ ملیسیان فا نگا: هەڵ ملیسیان.

**هەڵمەت:** پەلامار، هجوم، شاڵاو فا حمله.

**هەڵمەت بردن:** شاڵاوبردن فا حمله بردن.

**هەڵمەت دان:** پەلاماردان فا حمله کردن.

**هەڵمەت دەر:** شاڵاوبەر فا حمله کننده، مهاجم.

**هەڵمەتە کاسە:** زۆرخۆری زگ لەوەڕێن فا شکم‌پرست انگل.

**هەڵمەقۆ:** جۆرێ گەمە بە چەو، بازەڵێن فا نوعی بازی با شن، یەقُل دوقُل.

**هەلمەلە:** چەقەو هەرا، گیڕەو نیڕە فا جنجال و غوغا.

**هەڵمەڵە:** هەرمەڵە، هێرۆ فا گل ختمی.

**هەڵ میزان:** بەپێوە گمێزکردن فا ایستاده شاشیدن.

**هەڵ میزتن:** هەڵ میزان فا ایستاده شاشیدن.

**هەڵ میستن:** ١) هەڵ میزتن؛ ٢) هەڵ ملیسیان فا ١) ایستاده شاشیدن؛ ٢) نگا: هەڵ ملیسیان.

**هەڵ میسین:** هەڵ ملیسیان فا نگا: هەڵ ملیسیان.

**هەڵ نان:** ١) دەبەرچاوگرتن: (کارێکم هەڵناوە بۆی دەچم)؛ ٢) هەڵدان، پێداهـەڵـدان، پەسن‌دان؛ ٣) هەڵ پەساردن؛ ۴) بردنەژووری باڵندەی ماڵی: (ئێوارێ مریشکـەکـانم **هەڵنا**) فا ١) درنظر گرفتن؛ ٢) مدح کردن؛ ٣) چیزی را به چیزی تکیه دادن؛ ۴) جاکردن پرندگان خانگی.

**هەڵ ناوین:** هەڵ کێشان بەرەوسەرەوە: (**هەڵ ناوینی خوڵی تەنوورچەنی**

تێ ئه‌چێ؟) ف بالا کشیدن.
**هه‌لنایا:** تاواوه، تاوێنراو ف ذوب شده.
**هه‌لنایش:** تواندنه‌وه ف ذوب کردن.
**هه‌ڵنج:** حۆق، ده‌نگی به‌ر له ڕشانه‌وه ف تهوّع.
**هه‌ڵنگافتن:** سه‌ره‌نگرێ بوُن ف سکندری خوردن.
**هه‌ڵنگفتن:** هه‌ڵنگافتن ف سکندری خوردن.
**هه‌ڵ نوارین:** هه‌ڵڕوانین ف به‌بالا نظر کردن.
**هه‌ڵ نوُتن:** هه‌ڵنگافتن ف سکندری خوردن.
**هه‌ڵ نوُزان:** نوُزه‌نوُزکردن به زه‌لیلی ف لابه و زاری کردن.
**هه‌ڵ نۆشین:** یه‌کجێ وه‌خواردن ف لاجرعه سرکشیدن.
**هه‌ڵ نیشتن:** نیشتنی په‌له‌وه‌ر ف برنشستن پرنده.
**هه‌لۆ:** ۱) پێش‌وته‌ی ته‌له‌فۆن؛ ۲) شوان‌خه‌ڵه‌تێنه، باڵداریکه؛ ۳) لوُس، دژی زبر ف ۱) الو، کلمهٔ پاسخ تلفن؛ ۲) پرنده‌ایست؛ ۳) صاف، مخالف زبر.
**هه‌ڵۆ:** باڵدارێکی ڕه‌شی ڕاوکه‌ره زۆر به‌قه‌وه‌ته، ئه‌یلۆ، ئه‌لوه ف عقاب سیاه.
**هه‌ڵوُ:** هه‌ڵۆ ف عقاب سیاه.
**هه‌ڵوا:** حه‌لوا، چیشتی ئاردو دۆشاوو ڕۆن ف حلوا.
**هه‌ڵواستن:** هه‌ڵاوه‌سین ف آویزان کردن.
**هه‌ڵ واسران:** هه‌ڵاوه‌سران ف آویزان شدن.
**هه‌ڵ واسراو:** هه‌ڵاوه‌سراو ف آویزان شده.
**هه‌ڵ واسین:** هه‌ڵاوه‌سین ف آویختن.
**هه‌ڵوای‌سه‌رپنج:** برێتی له گوی سه‌گ: (**هه‌ڵوای سه‌رپنجێ** یان گوی نێره‌قنجێ) «مه‌سه‌ل» ف کنایه از مدفوع سگ.
**هه‌ڵوایی:** شیرین وه‌ك هه‌ڵوا ف حلوامانند.
**هه‌ڵوُجه:** عه‌لوُکه ف آلوچه، آلو.
**هه‌ڵوُچکه:** عه‌لوُکه‌ڕه‌شه ف آلو بخارا.
**هه‌ڵوُچه:** عه‌لوُکه ف آلوچه، آلو.
**هه‌ڵوُچه‌قه‌یسی:** حه‌مشین، میوه‌یه‌که ف شلیل.
**هه‌ڵۆدان:** هه‌ڵدانه‌وه ف بالازدن.
**هه‌ڵۆدڕین:** هه‌ڵدڕین ف برشکافتن.
**هه‌لوربلور:** حلوربلور، حللوربللور ف اتل متل.
**هه‌ڵۆرك:** جۆلانه‌ی گوریس ف تاب برنشستن.
**هه‌لـۆرکـه:** ۱) جۆلانـه‌ی گوریس؛ ۲) جۆلانه‌ی تێدانوستنی زارۆك و نه‌خۆش ف ۱) تاب؛ ۲) ننو.
**هه‌ڵوُرکه:** جۆرێ هه‌ڵپه‌ڕکێی کیژۆڵان ف نوعی رقص دخترکان.
**هه‌ڵوُژه:** هه‌ڵوُجه، عه‌لوُچه ف آلوچه، آلو.
**هه‌ڵوُشه:** گوڵێکه ف گلی است.
**هه‌ڵ وشین:** هه‌ڵ کوشین ف برفشردن.
**هه‌لوُك:** ۱) له‌تی پچوُك له دوداری گه‌مه‌یه‌کی منالان؛ ۲) داری داره‌ڕای خانوُ ف ۱) قطعهٔ کوچکتر از ابزار الك دولك بازی؛ ۲) دیرك خانه.
**هه‌لـوُکـان:** گه‌مـه‌یه‌کی زارۆکانه به دارێکی دوبستی له دارێکی پچوُك ده‌ده‌ن ف بازی الك دولك.
**هه‌لوُکێن:** هه‌لوُکان ف بازی الك دولك.
**هه‌ڵۆڵ:** هلۆڵ، ناوخاڵی ف کاوك، توخالی.
**هه‌ڵ وڵین:** له‌نـاو ده‌ستا وردکردن، هه‌ڵپریواندن له‌ناو ده‌ستا ف خردو ریز کردن در مشت.
**هه‌لـونـه:** گوندێکه له کوردستان به‌عسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.
**هه‌ڵوُهاوردن:** هه‌ڵهاوردن ف نگا: هه‌ڵهاوردن.
**هه‌ڵوه‌دا:** ته‌ره، ئاواره‌ی ده‌شت‌و کێو ف متواری.
**هه‌ڵ وه‌ران:** داوه‌رین ف ریختن برگ درخت و میوه و... از بالا به پایین.
**هه‌ڵ وه‌رانـدن:** له سه‌ره‌وه ڕژانـدنـه‌خواره‌وه: (میوه **هه‌ڵ وه‌راندن**، گڵ هه‌ڵ وه‌راندن، فرمێسك **هه‌ڵ وه‌راندن**) ف از بالا ریزش دادن.
**هه‌ڵ وه‌راو:** داوه‌ریو ف ازبالا به پایین ریخته.
**هه‌ڵ وه‌رین:** هه‌ڵوه‌ران ف نگا: هه‌ڵوه‌ران.
**هه‌ڵ وه‌ریو:** داوه‌ریو ف ازبالاریخته.
**هه‌ڵ وه‌زانه‌وه:** هه‌ل به‌زینه‌وه ف یکهو برجستن.
**هه‌ڵ وه‌زنین:** کۆکـردنه‌وه‌و گلۆڵه‌کردنی به‌ن‌و گوریس ف جمع کردن و گلوله‌کردن نخ و....
**هه‌ڵ وه‌زین:** هه‌ڵ به‌زین ف برجستن.
**هه‌ڵ وه‌زینه‌وه:** هه‌ڵ به‌زینه‌وه ف برجستن ناگهانی.
**هه‌ڵ وه‌ژارتن:** ۱) لێك جیاکـردنـه‌وه؛ ۲) ڕێك‌وپێك کردن: (مـاڵه‌که‌ی **هه‌ڵ وه‌ژارت**) ف ۱) ازهم جداکردن؛ ۲) تنظیم کردن.
**هه‌ڵ وه‌ژاردن:** هه‌ڵوه‌ژارتن ف نگا: هه‌ڵوه‌ژارتن.
**هه‌ڵ وه‌ژێران:** ۱) لێکـه‌وه‌جیابـوُن؛ ۲) ڕێك‌وپێك کران ف ۱) از هم جداشدن نیك و بد؛ ۲) منظّم شدن.
**هه‌ڵ وه‌ژێراو:** ۱) لێك جیاوه‌کـراو؛ ۲) ڕێك‌وپـێك کراو: (مـاڵ **هه‌ڵ وه‌ژێراوه**) ف ۱) از هم جداشده؛ ۲) تنظیم شده.
**هه‌ڵ وه‌سان:** ڕاوه‌ستان به‌قیته‌وه، قیت ڕاوه‌ستان ف راست ایستادن.
**هه‌ڵوه‌ست:** ۱) هه‌ڵبه‌ست؛ ۲) وێستانێکی که‌م؛ ۳) بیر و هزر ده‌رباره‌ی شتێ: (**هه‌ڵوه‌ستی تۆ چیه؟**) ف ۱) نگا: هه‌ڵبه‌ست؛ ۲) توقّف کوتاه؛ ۳) فکر و موضع شخص دربارهٔ چیزی.
**هه‌ڵ وه‌ستان:** ۱) ڕاست‌و قیت ڕاوه‌ستان؛ ۲) به‌دیار شتێکه‌وه وێستان ف ۱) راست ایستادن؛ ۲) دور چیزی ایستادن.
**هه‌ڵ وه‌ستن:** هه‌ڵ به‌ستن ف نگا: هه‌ڵ به‌ستن.
**هه‌ڵ وه‌سته:** هه‌ڵ به‌سته ف نگا: هه‌ڵ به‌سته.
**هه‌ڵ وه‌شـان:** ۱) له‌بـه‌ریه‌ك‌چوُن: (خـانوه‌که‌مان **هه‌ڵ وه‌شاند**)؛ ۲) دڕانی جێ‌ته‌قـه‌ڵ: (درواوه‌کـه‌ی **هه‌ڵ وه‌شاند**) ف ۱) ازهم بازشدن، متلاشی شدن؛ ۲) بر دریدن بخیه‌زده.
**هه‌ڵ وه‌شـاندن:** ۱) له‌به‌ریه‌ك‌بردن؛ ۲) دڕاندنه‌وه‌ی ته‌قه‌ڵ لێدراو ف ۱) ازهم بازکردن؛ ۲) پاره کردن بخیه‌زده.
**هه‌ڵ وه‌شانن:** هه‌ڵوه‌شاندن ف نگا: هه‌ڵوه‌شاندن.
**هه‌ڵ وه‌شێن:** کـه‌سێ که هـه‌ڵوه‌شاندن کاریـه‌تی ف اسم فاعل

«هەڵوەشاندن».

**هەلوەلا:** هاتوچۆ و زۆر ماندوبوُن لەشوێن کارێك: (کەوتونە **هەلوەلا**) ف تکاپوی بسیار.

**هەڵـوێ:** ۱) ناوی گونـدێکە؛ ۲) خورویلکە، خورێکە، ئاوڵە ف ۱) نام دهی است؛ ۲) آبله.

**هەڵ وێزناو:** بەن و گوریسی کۆکراوەی گلۆڵەکراو ف نخ و... جمع شدهٔ گلوله شده.

**هەڵ وێزندراو:** هەڵوێزناو ف نگا: هەڵوێزناو.

**هەڵ وێزنراو:** هەڵوێزناو ف نگا: هەڵوێزناو.

**هەڵ وێزنین:** هەڵوەزنین ف نگا: هەڵوەزنین.

**هەڵوێس:** ۱) هەڵوەست، وێستانی کەم، وچان؛ ۲) هزر و بیر دەربارەی شتێ ف ۱) توقّف کوتاه؛ ۲) فکر و موضع دربارهٔ چیزی.

**هەڵ وێسان:** هەڵوەستان ف نگا: هەڵوەستان.

**هەڵوێست:** هەڵوێس ف نگا: هەڵوێس.

**هەڵ وێستان:** هەڵوەستان ف نگا: هەڵوەستان.

**هەڵوێشکێ:** لەوەتا، لەوساوە ف از آن هنگام.

**هەڵوێنی:** ۱) دەنکەقەیسی شیرین؛ ۲) قەیسی دەنك شیرن ف ۱) هستهٔ شیرین زردالو؛ ۲) زردالوی هسته شیرین.

**هەلە:** ۱) دەرفەتە؛ ۲) وتەی خۆش و بێشی؛ ۳) تاوێستاش؛ ۴) کەوابو؛ ۵) هەل، تاو، دەم؛ ۶) بەتایبەتی؛ ۷) هەڵە؛ ۸) گوڵێکی زۆر جوانەو بە چەنـد ڕەنگانە سوُر و زەرد و ڕەشی هەیە ف ۱) دم غنیمت است؛ ۲) کلمهٔ خوش آمد؛ ۳) تاکنون، هنوز هم؛ ۴) پس، حال که چنین است؛ ۵) دم، وقت؛ ۶) بەویژه؛ ۷) سهو؛ ۸) نام گلی است زیبا.

**هەڵە:** ۱) سەهو، خەڵەت؛ ۲) ئامرازی بێژانی کون‌درشت ف ۱) سهو، غلط؛ ۲) بیزن سوراخ درشت.

**هەڵهاتگ:** هەڵاتو ف نگا: هەڵاتو.

**هەڵهاتن:** هەڵاتن ف نگا: هەڵاتن.

**هەڵهاتو:** هەڵاتو ف نگا: هەڵاتو.

**هەڵ هانین:** ۱) بڵنـدکـردن؛ ۲) جوچکـە لە هێلکە دەرێنان؛ ۳) زانینی مەتەڵ ف ۱) بلندکردن؛ ۲) جوجه از تخم درآوردن؛ ۳) حلّ کردن معمّا.

**هەڵ هاوردن:** ۱) هاوردنـەوە لە گەروُڕا، ڕشـانەوە؛ ۲) هەڵهانین ف ۱) بالاآوردن، قی کردن؛ ۲) نگا: هەڵهانین.

**هەڵ هاوردنەوە:** ڕشانەوە ف قی کردن.

**هەڵ هاویتن:** هەڵاویتن ف نگا: هەڵاویتن.

**هەڵ هاویشتن:** هەڵاویشتن ف نگا: هەڵاویشتن.

**هەڵەباش:** تۆڕەو قوشقی و سڵ ف حیوان رموك و رام نشده.

**هەڵـەبـجـە:** شارێکی گەورەی کوردستـــان بەعسی بە بومبـــای شیمیایی دەهـەزارکـەسی لێ کوشت و دەهـەزاری بریندار کرد ف از شهـرهـای بزرگ کردستان که توسط بعثیان بمباران شیمیایی شد و دههزارتن در آن کشته و دههزار تن زخمی شدند.

**هەڵـەبەل:** ۱) هەراو هوریاو زەنازەنا؛ ۲) دڵخورتی و پەریشانی ف ۱) جار و جنجال؛ ۲) اضطراب.

**هەڵەپاس:** سەگی زۆروەڕ ف سگ بسیار پارس کننده.

**هەڵەپەزە:** جانەوەرێکە لەجْسنی جوڵاتەنە زەردە،قژقژە، پس‌پسەکوڵە ف رُتیل.

**هەڵەت:** زەردو ماهی زۆر سەخت ف پرتگاه سخت درکوه.

**هەڵەتانج:** جۆرێ مراوی سوُر و سپی کاکۆڵدار ف نوعی مرغابی سرخ و سفید شانه بسر.

**هەڵەخۆر:** پیس‌خۆر، دژخۆر ف بدخوراك.

**هەڵەخەرج:** دەست‌بڵاو ف ولخرج.

**هەڵەداوان:** پەلەی زۆر ف شتابان.

**هەڵەدن:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**هەڵەرە:** هەڵوُکێن ف بازی الك دولك.

**هەڵەرەش:** هەڵەی ڕەنگ‌ڕەش کە گوڵێکی زۆر جوانە ف گلی است.

**هەڵەز:** هەڵز، گیایەکی گەڵادەرزی‌یە ف گیاهی است.

**هەڵەزبوری:** برێتی لە هەل و دەرفەت لەدەس‌چوُن ف کنایه از فرصت ازدست رفتن.

**هەڵەزەر:** هەڵەی ڕەنگ‌زەرد کە گوڵێکی جوانە ف گلی است.

**هەڵەسو:** بابوڵەی ڕۆن‌تێ‌ساوراو ف ساندویچ نان روغنی.

**هەڵەسوُر:** گوڵی هەڵەی ڕەنگ‌سوُر ف گلی است.

**هەڵهسون:** ۱) ساوین، پیاماڵین؛ ۲) ئەسترین، سڕین ف ۱) برمالیدن، اندودن؛ ۲) زدودن.

**هەڵەسوُن:** دوبارە سەوزبوُنەوە پاش وشك‌بوُن و دروُن ف بازسبزشدن گیاه.

**هەڵـەسـوُن‌هێنـانـەوە:** ۱) لەسـەرڕا سەوزبـوُنـەوە: (مێرگەکەم ئاودا **هەڵـەسوُنی هێناوەتەوە**)؛ ۲) برێتی لە دوبارە داواکردن: (بەشم داوە دیسان **هەڵەسوُنی هێناوەتەوە**) ف ۱) ازنو سبزشدن بعد از درو؛ ۲) کنایه از توقّع و ادّعای دوباره.

**هەڵەسیایا:** ۱) بوُن‌گرتو لەڕزیویان؛ ۲) برێتی لە قەڵەوی تەمەڵ ف ۱) گندیدهٔ بو گرفته؛ ۲) کنایه از فربه تنبل.

**هەڵەشە:** ۱) بەپەلەو لەڕێ‌لادەر؛ ۲) سەرەڕۆ، گوێ‌نەبیس ف ۱) شتابزده و بیراهەرو؛ ۲) خودرأی و حرف نشنو.

**هەڵـەشەیی:** ۱) پەلەو لەڕێ‌لادان؛ ۲) سەرەڕۆیی، گوێ‌نەبیسی ف ۱) عجله و بیراهه رفتن؛ ۲) حرف نشنوی.

**هەڵەفە:** قوڵفە، قوڵفەی گوریس ف حلقهٔ رسن.

**هەڵەق‌مەلەق:** حەللەق‌مەللەق ف سخنان بیجا و نامربوط.

**هەڵەقەمەلەقە:** حیندرحوٚ، سیسوٚ، هەڵلادوٚشە ف آلاکلنگ.

**هەڵەك:** ۱) ئاڵقە؛ ۲) خوار، لار؛ ۳) خوارایی وەك کەوان، نیوەجەغز؛ ۴) زڕ ف ۱) حلقه؛ ۲) کج؛ ۳) نیم‌دایره؛ ۴) ناتنی.

**هەڵەکا:** جەزمە، سەمای دەروێشان ف جذبه، سماع درویشان.

**هەڵەکار:** ۱) کەسێ کاری ناڕەوا دەکا؛ ۲) سەهوکەر ف ۱) بدکار؛ ۲) اشتباه کار.

**هەڵەکردن:** ۱) سەهوکردن؛ ۲) لەڕێ‌دەرچوُن: (ڕیگەی **هەڵەکردوە**) ف ۱) اشتباه کردن؛ ۲) ره گم کردن.

**هەڵەکۆك:** ئاڵەکۆك ف گیاهی است با پیازه خوراکی.

**هەلەکە:** مشك گره ف پرنده ایست شکاری.

**هەلەکەت:** بزوُتن، حەرەکەت ف حرکت.

**هەلەکەسەما:** هەلەکە ف نگا: هەلەکە.

**هەڵەگەڕ:** گەڕیدەی سەرگەردان ف ولگرد.

**هەلەلە:** ۱) بالۆرەلێدان بە گەروُ؛ ۲) تێ‌بەردانی سەگ ف ۱) هلهله؛ ۲) تحریك سگ.

**هەلهلی:** ۱) میوەی بڵ‌و زۆر گەیشتـو؛ ۲) پیری تەواو کەنـەفت ف ۱) میوهٔ رسیدهٔ نرم شده؛ ۲) پیر فرتوت.

**هەلهلین:** ۱) بڵ‌بوُن‌و زۆر گەیشتنی میوە؛ ۲) لەپیریان لەتاقەت کەوتن، زورهان‌بوُن ف ۱) رسیدن و نرم شدن میوه: ۲) پیرشدن و ازکار افتادن.

**هەلەم:** جێگەی زۆر بەرزو سەخت، هەڵەموُت، ئەڵەموُت، هەزار بەهەزار ف کوهستان صعب‌العبور.

**هەڵـەم:** ۱) نەخـۆشی هەرزنەی ترێ؛ ۲) هوُشی ترێ کە چەند دەنکی درشت‌و باقی وردن ف ۱) بیماری شکوفهٔ انگور؛ ۲) خوشه انگور با چند حبّه درشت و بقیه ریز.

**هەلەمار:** ۱) پەلامار، شاڵاو؛ ۲) ژیلەمۆ ف ۱) حمله؛ ۲) خاکستر گرم.

**هەڵەمارکەر:** پەلاماردەر، زاڵم، دەست‌درێژکەر ف متعدّی، متجاوز.

**هەلەمتە:** خۆڕایی، مفت ف مفت.

**هەلەمتەچی:** ۱) مفت‌خۆر؛ ۲) شەلاتی ف ۱) مفتخور؛ ۲) شارلاتان.

**هەڵەم‌کردن:** وەرینی هەرزنەی ترێ ف ریزش شکوفهٔ انگور از بیماری.

**هەڵەموُت:** زەردو ماهی زۆر سەخت، هەزار بەهەزار، هەلەم ف کوه مُرتفع صعب‌العبور.

**هەڵەمور:** ژیلەمۆ، زیلەمۆ ف خاکستر داغ.

**هەڵەنگوُتن:** هەڵنگفتن، سەرەنگرێ‌بوُن ف سکندری خوردن.

**هەلەو:** هەلۆ ف نگا: هەلۆ.

**هەڵەودان:** هەڵدانەوە ف نگا: هەڵدانەوە.

**هەڵەوگەڕ:** هەڵگێڕەوە ف برگرداننده، زیروروکننده.

**هەڵەوگەڕان:** هەڵ گەڕانەوە ف نگا: هەڵ گەڕانەوە.

**هەڵەوگەڕانن:** هەڵ گەڕاندنەوە ف نگا: هەڵ گەڕاندنەوە.

**هەڵەوگەڕاننەوە:** هەڵ گەڕاندنەوە ف نگا: هەڵ گەڕاندنەوە.

**هەڵەوگەڕیاگ:** هەڵ گەڕاوە ف نگا: هەڵ گەڕاوە.

**هەڵەوگەڕیان:** هەڵ گەڕانەوە ف نگا: هەڵ گەڕانەوە.

**هەڵەوهاوردن:** هەڵهاوردنەوە ف نگا: هەڵهاوردنەوە.

**هەڵـەوەڕ:** ۱) هەڵـەپاس؛ ۲) بریتی لە چەنەباز، چەقەسرۆ ف ۱) سگ بسیار واق کننده؛ ۲) کنایه از وراّج.

**هەلهەلاك:** هەلالوك ف آلبالوی کوهی.

**هەلهەلۆك:** ئاڵو باڵوی کێوی، هەلالوك ف آلبالوی کوهی.

**هەلهـەلـە:** ۱) هەلـەلـە، بالۆرە بە گەروُ؛ ۲) خراپ، نەشیاو؛ ۳) بۆنی ناخۆش ف ۱) هلهلهٔ شادی؛ ۲) ناپسند، ناشایست؛ ۳) بوی بد و نامطبوع.

**هەلەهەل:** فرسەتە، دەرفەتە ف فرصت حاصل است.

**هەڵەهەڵ:** قسەی بەپەلەپەل ف سخن گفتن با شتاب.

**هەڵ‌هێن:** ۱) بڵنـدکـەر؛ ۲) هێلکە بەجوچکەکەر ف ۱) بلندکننده؛ ۲) آنکه جوجه از تخم به عمل آورد.

**هەڵ‌هێنان:** هەڵهانین ف نگا: هەڵهانین.

**هەڵ‌هێنجان:** بە دەفر لە تراو هەڵ‌کێشان ف آب برکشیدن.

**هەڵەیی:** هەڵەکاری ف ۱) انحراف؛ ۲) اشتباه.

**هەلی:** ۱) حەلی، زڕ: (کـوڕهـەلی واتا: زڕکوڕ)؛ ۲) توایەوە؛ ۳) تاوێك، دەموکەیەك ف ۱) ناتنی؛ ۲) ذوب شد؛ ۳) دمی، لختی.

**هەڵی:** زۆربڵندی، هەڵەت ف پرتگاه صعب‌العبور.

**هەڵێ:** ۱) ڕاکـە؛ ۲) ڕاکـات؛ ۳) لە عاسمان دیاری بدا؛ ۴) بڵند ببێ: (ئـەگەر بۆم **هەڵێ** باشـە)؛ ۵) هەڤیر پێ‌بگـا؛ ۶) تەواوبێ: (دەبێ عیددەی **هەڵێ** جا مێردی دەکا)؛ ۷) نێر سواری میوینە بێ: (کەری لێ **هەڵێ** لەوکارە باشترە) ف ۱) بگریز؛ ۲) بگریزد؛ ۳) طلوع کند؛ ۴) بلنـدشـود؛ ۵) خمیر بـرآید؛ ۶) مدّت سرآید؛ ۷) گشن بر مادینه سوار شود.

**هەلیان:** ۱) توانەوە؛ ۲) هەڵاتن لە شەڕدا: (زیخ‌بە نە **هەلێ**) ف ۱) ذوب شدن؛ ۲) فرار در جنگ.

**هەلێب:** حەلیب، دروس، ڕەوا ف جائز، روا.

**هەڵیت:** ۱) شتی بێ‌قیمەت، خرت‌و پرت؛ ۲) قسەی بێ‌مانا: (**هەڵیت‌و پەڵیت ئێژێ**) ف ۱) آت و آشغال، خرت و پرت؛ ۲) سخن بی معنی، چرت و پرت.

**هەڵیتْر:** کاروش، گیایەکە ف گیاهی است.

**هەڵیتْرگ:** هەڵیتْر ف نگا: هەڵیتْر.

**هەلێر:** ناوەند، چەق ف مرکز.

**هەلیز:** کا، پوُش ف کاه، خس.

**هەڵیز:** مەشکە ف مشك.

**هەڵیزەبڕە:** مەشکەدڕە ف ملخی است سیاه.

**هەڵیس:** وشکەگیا، پوُش، هەلیز ف خس، علف خشك.

**هەلیسکان:** خلیسکان ف نگا: خلیسکان.

**هەلیسە:** ۱) هەریسە، کەشکەك؛ ۲) پڵاو ساوار ف ۱) حلیم؛ ۲) پلو بلغور.

**هەلیل:** جۆرێ هەڵوایە کە دۆشاوی وشکەوەبوە، هەریر ف نوعی حلوا.

**هەلیلە:** بەری دارێکە لە هێندستان دەڕوێ ڕەش‌و زەردی هەیە بۆ دەرمان دەبێ ف هلیله.

**هەلیماو:** شۆرباوبرنجی بێ‌ڕۆن ف سوپ برنج بدون چربی.

**هەلین:** ۱) بڵندکە؛ ۲) ببە؛ ۳) لابە؛ ۴) توانەوە: (بهارێ بەفر **دهەلێ**) ف ۱) بلندکن؛ ۲) باش؛ ۳) کنارببر؛ ۴) ذوب شدن.

**هەلێن:** هەڵدەوە، لاگرە: (چارێ **هەلێن**، پەردا **هەلێن**) ف بالازن.

**هەڵێن:** ۱) بڵندکە؛ ۲) ڕاکەن، غاردەن ف ۱) بلندکن؛ ۲) فرارکنید.

**هەڵێنان:** هەڵهێنان ف نگا: هەڵهێنان.

**هەڵێنانــەوە:** ۱) کوڵانــدنەوەی دۆی مەشکەو تیژاوی پەنیر؛ ۲) دوای پێشگـری «تێ» بەمـانـا قەرەبـوکـردنـەوە: (تێت **هەڵێنـایەوە**)؛ ۳) بڵنـدکردنەوە: (هەنگاو **هەڵێنانەوە**)؛ ۴) بڕینی پارچە بۆ درونی جل: (تێفـەکی دەرێکە **هەڵێنەوە**) ف ۱) جوشانیدن دوغ و آب پنیر؛ ۲) پس از پیشـونـد «تێ» به معنی جبـران کردن؛ ۳) بازبـرداشتن و بلندکردن؛ ۴) برش دادن پارچه برای دوختن لباس.

**هەلینایش:** تواندنەوە، تاواندنەوە ف ذوب کردن.

**هەڵێنجان:** هەڵهێنجان ف آب برکشیدن.

**هەلینگ:** ۱) غار، راکردن: (**هەلینگدە**)؛ ۲) دەلینگی دەرپێ ف ۱) دو، دویدن؛ ۲) پاچهٔ شلوار.

**هەلینگدان:** راکردن، غاردان ف دویدن.

**هەلینگدە:** غاردە ف بدو.

**هەلینگدەر:** کەسێ کە غار بە ئەسب دەکا ف سوارکار.

**هەلیە:** ۱) کەمێك؛ ۲) لەسوچیکەوە ف ۱) اندکی؛ ۲) ازگوشه‌ای.

**هەم:** ۱) دژی وشـەی نیم، لە بوُن بەشـدارم؛ ۲) وتـەی دوبـارە: (**هەم** هاتەوە)؛ ۳) وتەی بەشداری، هاو، هام، ئام؛ ۴) پیتی بادانەوە، ژ، ش؛ ۵)تەنانەت؛ ۶) وەك، راستوەك: (من ئەو دیت **هەم** باژێرێ واتا: وەك خەڵكی شار وابو) ف ۱) هستم؛ ۲) باز، دوباره؛ ۳) حرف اشتراك، هم؛ ۴) حرف عطف؛ ۵) حتی؛ ۶) کاملا مشابه.

**هەما:** ۱) هما، هەروا، ئیتر ئاوا؛ ۲) لەم نزیکانە: (**هەما** تە دیت چاوا چێ دبە)؛ ۳) ئەوسا؛ ۴) ئیتر؛ ۵) هێمان، هێشتا ف ۱) این طور؛ ۲) در این نزدیکی‌ها؛ ۳) آنگاه؛ ۴) دیگر؛ ۵) هنوز.

**هەمار:** عەنبار ف انبار.

**هەماراو:** عەنباراو ف آب انبار.

**هەمارکردن:** عەنبارکردن ف انبارکردن.

**هەمارەپۆ:** عەمارەپۆ ف پوسیده در انبار.

**هەماز:** ۱) مناڵدان؛ ۲) ئاواڵمنداڵ ف ۱) زهدان؛ ۲) جفت نوزاد.

**هەمـاڵ:** ۱) کوڵهەڵگر بە مز، عەمباڵ، حەنباڵ، عەمبار؛ ۲) حەمایەڵ، نوشتـەی دەبـەرگ‌گیراوی دەلاشـان‌کراو؛ ۳) قایشێکە بەکورتانەوە شۆڕبـوتـەوە ف ۱) حمّال؛ ۲) دعای نوشتهٔ حمایل شده؛ ۳) تسمهٔ آویزان به پالان.

**هەمالکی:** وەك حەنبالان ف حمّال‌آسا.

**هەمالیا:** مزی حەنبالی ف مزد حمّالی.

**هەمان:** ۱) هەر ئەو؛ ۲) گشتیان: (**هەمان** بێنە)؛ ۳) همبان؛ ۴) تەواو وەك ف ۱) همان؛ ۲) همگی؛ ۳) انبان؛ ۴) عیناً.

**هەمـانـدن:** کردنـەپـاوان، قورغ‌کردن، قەدەغەکردن ف قدغن کردن، ممنوع کردن.

**هەمانگی:** بەحاستەمو دوبەلا ف بسیار به آهستگی.

**هەمانە:** ۱) لامان هەیە، شك‌دەبەین؛ ۲) همبان ف ۱) داریم؛ ۲) انبان.

**هەماواز:** هاوقسە ف هم‌قول.

**هەماوز:** دە یەكڕادەی عەقڵدا ف هم‌دانش.

**هەمایل:** ۱) قایشی شمشێر بەخۆوە هەڵواسین کە دەملی دەکەن؛ ۲) نوشتەی دەبەرگ‌گیراوی بە بەن دەمل‌کراو ف ۱) تسمهٔ حمایل کردن شمشیر؛ ۲) دعای نوشتهٔ حمایل شده.

**هەمبا:** بم‌بوایە ف میداشتم.

**هەمبار:** عەنبار، هەمار، مەکۆی کەلوپەل لە ماڵ یان لە دوکاندا ف انبار.

**هەمباز:** هەواڵ، دۆست ف رفیق، دوست.

**هەمبازی:** هەواڵەتی ف رفاقت.

**هەمباژاڕی:** ۱) هاوشاری؛ ۲) هاوولاتی ف ۱) همشهری؛ ۲) هموطن.

**هەمباژێری:** هەمباژاڕی ف نگا: هەمباژاڕی.

**هەمبان:** همبان، هەمان، هەمانە ف انبان.

**هەمبانە:** هەمبان ف انبان.

**هەمبانـەبـۆرینە:** هەمبانەیەکە لە چیرۆکی کەونارادا. *دەڵێن دەستیان تێ‌ڕۆکردوەو هەرچی ویستویانە تیابوەو بە دەستیانەوە هاتوە* ف انبان جادویی در افسانه‌ها که گویا محتوی همه چیز بوده است.

**هەمبانەگۆرینە:** هەمبانەبۆرینە ف نگا: هەمبانەبۆرینە.

**هەمبز:** هامێز، ئامێز، باوەش ف آغوش.

**هەمـبس:** ۱) جۆرێ بزنـی گوێ‌سور؛ ۲) دەخـڵی شینـی گێزدراوی تێك‌هالاو ف ۱) نوعی بز گوش قرمز؛ ۲) غلّهٔ سبزدرهم آویخته.

**هەمبەر:** بەرانبەر، هەمبەر ف برابر، مقابل.

**هەمبەلی:** ۱) لەسەر مەزەبی ئیمام ئەحمەدی حەنبەلی؛ ۲) دڕدۆنگ لە پاك‌بوُنەوە ف ۱) پیرو مذهب حنبلی؛ ۲) دارای وسواس در نظافت.

**هەمبێز:** هەمبز، ئامێز، باوەش ف آغوش.

**هەمبێزە:** دوانە، ئاواڵدوانە، جمك، جفی ف دوقلو.

**هەمپا:** ۱) دەوڵەمەندی گوند؛ ۲) هاوسنف، هاوپیشە؛ ۳) ئاوتا، هاوتا ف ۱) ثروتمندده؛ ۲) هم‌پیشه؛ ۳) همتا.

**هەمپازی:** شانازی: (ئەم **هەمپازی** بتە دکن) ف افتخار.

**هەم‌پشت:** هاوپشت، لایەنگر، دژداری یەکتر ف هوادار یکدیگر.

**هەم‌پشك:** هاوبەش ف شریك.

**هەم‌پەیمان:** هاوپەیمان ف هم‌پیمان.

**هەمپیاڵە:** هام‌پیاڵە، هاوپیاڵە ف نگا: هام‌پیاڵە.

**هەمت:** ژدل، داوتەڵەب، داخوازی، بەبێ زۆری‌لێ‌کردن ف داوطلب.

**هەمتز:** جاشەکەری یەکبڕ ف کرّه‌خر یکساله.

**هەمتی:** ۱) دیسان، دوبارە؛ ۲) گەنمەکوتاو ف ۱) دوباره، باز؛ ۲) گندم کوبیده.

**هەمچولا:** ۱) جولانەی مناڵو نەخۆش؛ ۲) جولانە بەگشتی ف ۱) ننو ویژهٔ کودك یا بیمار؛ ۲) تاب.

**هەمخەو:** هاوسەر ف همخوابه.

**هەمـد:** ۱) حەمـد؛ ۲) ویست، بڕیار: (بێ **هەمـدێ** خۆ ئەز چوم)؛ ۳) بەردی قەبر، کێل ف ۱) ستایش؛ ۲) اراده؛ ۳) سنگ قبر.

**هەمدامدا:** دەس‌بەجێ، هەرلەجێ، بێ درەنگ‌کردن، دەستەولەجێ ف فوراً، بی‌درنگ.

**هەمدز:** جسنەکەرێکی چکۆڵە ف نوعی الاغ ریزجثه.

**هەمدەرد:** هاودەرد ف همدرد.

**هەمدەم:** هاودەم ف همدم.

**هەمدیس:** دیسانەوە ف بازدوبارە.

**هەمدیسا:** هەمدیس ف بازدوبارە.

**هەمدیسان:** هەمدیس ف باز دوبارە.

**هەمدیسانەوە:** هەمدیس ف بازدوبارە.

**هەمدیسرۆ:** هەمدیس ف بازدوبارە.

**هەمڕا:** ۱) پێکەوە؛ ۲) هاوڕێ ف ۱) باهم؛ ۲) همراه.

**هەمراز:** ئامراز، ئامێر، ئەسپاب ف ابزار.

**هەمڕاز:** ئاوڕاز، هاوڕاز ف همراز.

**هەمڕایی:** هاوڕێیەتی ف همراهی.

**هەمرۆ:** هەرمی، هەرمێ، ئەمرۆ، هارمێ ف گلابی.

**هەمرۆکوچکینە:** کرۆسك ف گلابی وحشی.

**هەمرۆڵە:** گوندێکی کوردستانە لە لای سنە ف نام دهی است.

**هەمڕەنگ:** هاوڕەنگ ف همرنگ.

**هەمـزا:** گونـدێکـە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**هەمزار:** هەماواز ف همقول.

**هەمزاغا:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان کە بعثیان آن را ویران کردند.

**هەمزالە:** چارداغی ناوباغ ف خانهٔ چوبی باغ.

**هەمزر:** هەمدز، جسنەکەرێکی کورتەڵەیە ف نگا: هەمدز.

**هەمزك:** ناوی چێشتێکە لە ناو خەڵکی بۆتان ف نام غذایی است.

**هەمزمان:** هاوزمان ف همزبان.

**هەمزە:** ناوە بۆ پیاوان ف حمزه، نام مردانه.

**هەمزەبەگی:** جۆرێ مازو ف نوعی مازوج.

**هەمزەل:** جۆرێ کایەی منالانە ف نوعی بازی کودکان.

**هەمـزیکێ:** لەو گونـدانـەی کوردستـانـە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان کە بعثیان آن را ویران کردند.

**هەمس:** مەڕو بزنی ڕەش و سوور ف گوسفند و بز سیاه و قرمز.

**هەمسا:** هاوسا، جیران ف همسایە.

**هەمساڵ:** هاوتەمەن ف همسال.

**هەمسەر:** ژن بۆ مێردو مێرد بۆژن، هەڤسەر ف همسر.

**هەمسین:** جۆرێ ڕەسەنی بزن، جۆرێ بزن ف نژادی از بز.

**هەمشاری:** هاوشاری ف همشهری.

**هەمشیر:** هاوشیر ف همشیر.

**هەمکە:** زۆر، گەلێك: (ئەم **هەمکە** پارە لەکوێ بێنم) ف بسیار.

**هەمگە:** هەمکە ف بسیار.

**هەمگەل:** ۱) هەرچی خوا دروستی کردوە؛ ۲) هاونەژاد ف ۱) کائنات، موجودات؛ ۲) همنژاد.

**هەمگەلی:** تێکڕای خاوەن‌هەیی ف همهٔ موجودات.

**هەمگین:** هەنگوین، هەنگڤ، هەنگەمین ف انگبین، عسل.

**هەمل:** ۱) ژنی زگپڕ؛ ۲) بارهەڵگر ف ۱) زن باردار؛ ۲) حمّال، باربر.

**هەمڵك:** ۱) دابەستە، پەروار؛ ۲) قەڵەو، تێرگۆشت ف ۱) پروار؛ ۲) فربە.

**هەمما:** ۱) هەرکە؛ ۲) هەر لەجێ؛ ۳) هەر، تەنیا: (**هەمما** تو ساغ بە ئەو نەتشتە) ف ۱) همینکە؛ ۲) فوراً؛ ۳) فقط.

**هەمن:** ۱) لێ کۆڵینەوە، توێژینەوە؛ ۲) خاوەنی ئەوشتانەم؛ ۳) هەمو، گش؛ ۴) هەمو یان ف ۱) پژوهش؛ ۲) اینها را دارم؛ ۳) همە؛ ۴) همهٔ آنها.

**هەمنك:** گوریسی پێوەندی یەکسم ف رسن پای‌بند ستور.

**هەمو:** ۱) هەمبان، هەمبانە؛ ۲) گش، تێگڕا، گشت، تەمام ف ۱) انبان؛ ۲) همە.

**هەمـوار:** ڕێك‌وپێك کەوتـو: (ئەم چوارچێوە دەگەڵ ڕەسمەکە **هەموارە**، پیاوێکی **ناهەموارە**) ف مناسب، باب.

**هەموان:** گشتیان، گشان ف همگان.

**هەموانی:** گشتی، بۆ هەموکەس ف همگانی.

**هەموتی:** بە دەستی گەل، تێکڕایی ف دستەجمعی.

**هەموکی:** بێ کەم‌وکوڕی، تەمامی ف کاملاً، بەکلّی.

**هەموڵەك:** ناوی پاڵەوانێکی چیرۆکانە ف پهلوانی افسانەیی.

**هەمە:** ۱) هەمو، گش؛ ۲) دێرم؛ ۳) ئێمە؛ ۴) بەڵام، بڵان ف ۱) همە، کلّ؛ ۲) دارم؛ ۳) ما؛ ۴) امّا.

**هەمەت:** ۱) لێ ڕوانین و سەیرکردن؛ ۲) سەیر و تواشایی: (کوڕینە وەرنە هەمەتێ)؛ ۳) بڕوایی: (تە **هەمەتا** خۆ دایە سەررکی)؛ ۴) زۆرهێنان و پڕایی: (**هـەمـەتا** ئاقی لسەرە)؛ ۵) یاریدە؛ ۶) پاراستن ف ۱) نگاه کردن، ملاحظه؛ ۲) عجیب و تماشایی؛ ۳) باور؛ ۴) فشار و تراکم؛ ۵) کمك؛ ۶) حفظ، نگهداری.

**هەمەتە:** ملاحەزە بکە، بیری لێ‌وەکە ف توجّه کن، ملاحظه کن.

**هەمەك:** وەفا، چاکە لەچاودابون، ئەمەگ ف وفا.

**هەمـەکـارە:** ۱) کەسێ کە دەسـەڵاتی زۆرە؛ ۲) کەسێ کە زۆر کاران دەزانێ ف ۱) بانفوذ و قدرتمند؛ ۲) وارد بە همە کار.

**هەمەکەس:** هەرکەس ف هرکس.

**هەمەگ:** ئەمەگ، وەفا ف وفا.

**هەمەندوش:** حەوجۆش ف هفتجوش، مفرغ.

**هەمهونە:** ئاوماڵ ف همخانە.

**هەمـەوەند:** ناوی عەشیرەتێکی کوردە کە هێندێکیان لەلایەن دەوڵەتی عوسمانیەوە بۆ لیبیا دورخراونەتەوە ف نام عشیرەای در کردستان.

**هەمهەم:** لە زاراوەی زارۆکاندا واتا: خۆراك ف خوراکی در لهجهٔ کودکانە.

**هەمهەمە:** هەراو هوریا، چەقەو گوڕە ف همهمه و غوغا.

**هەمی:** گشت، هەمو، گش ف همە.

**هەمیان:** ۱) گشیان؛ ۲) پشتێنـدی لە مێشن بۆ پارە تێداهـەڵگرتن؛ ۳) هەمبانە ف ۱) همگان؛ ۲) کمربند چرمی برای حمل پول؛ ۳) انبان.

**هەمیر:** هەڤیر ف خمیر.

**هەمێز:** ئامێز، باوەش ف آغوش.

**هەمیس:** دیسان ف دوباره، باز.

**هەمیسا:** هەمیس ف دوباره.

**هەمیسان:** هەمیس ف دوباره.

**هەمیسانەوە:** هەمیس ف دوباره.

**هەمیشە:** دایم‌و دەرهەم، بێ‌بڕانەوە ف همیشه.

**هەمیشەبەهار:** گوڵێکە ف گُل همیشه بهار.

**هەمیشەوەوی:** ژنێ که زۆر مێردان دەکا ف زنی که بسیار شوهر کند.

**هەمیشەیی:** بێ‌بڕانەوە ف همیشگی.

**هەمیلا:** ژنی سکپڕ ف زن باردار.

**هەمین:** ۱) سست‌و شلەپەتە؛ ۲) خۆ بەکارنەدەر، پاش گوێ‌خەری کار؛ ۳) ناوە بۆ ژنـان؛ ۴) بە تێکـڕایی، هەمـوُ، هەمی؛ ۵) تا ئێستە ف ۱) سست، تنبل؛ ۲) از زیر کار دررَو؛ ۳) نام زنانه؛ ۴) همگان؛ ۵) هنوز.

**هەمینە:** هەمو یان، گشت لەگشت ف همگان.

**هەن:** ۱) لەبـوُن‌دان؛ ۲) کەسـانێ بەوجـۆرەن؛ ۳) بوُد، دارایی؛ ۴) پێشگرێکە بەواتا: شیرینی: (**هەنگڤ، هەنجیر، هەنار، هەنی**،*تەنانەت هەنبان واتا: جێگەی شیرینی)* ؛ ۵) هەند، هێند، ئەوەندە ف ۱) هستند، موجودند؛ ۲) کسانی چنین هستند؛ ۳) دارایی؛ ۴) پیشوندی به معنی شیرینی؛ ۵) این اندازه.

**هەنـا:** ۱) هەتـەر، قەوەتی دیتن؛ ۲) گەیشتن: (تـا دەست **هەنـا** ئەکـا بالاّ بەرزە)؛ ۳) سرەوت: (قەت **هەنا** نادەم)؛ ۴) هانا، پەنا پێ‌بردن؛ ۵) فریا: (دەهـەنـام هات)؛ ۶) بەم‌جۆرە، ئاوەها ف ۱) بُرددید، نیروی دید؛ ۲) دسترسی؛ ۳) آسودن؛ ۴) پناه بردن؛ ۵) فریادرسی؛ ۶) این طور.

**هەنار:** نار ف انار.

**هەناران:** دوگوندی کوردستانن بەعسی وێرانی کردن ف نام دو روستای کردستان که توسط بعثیان ویران شد.

**هەناردن:** ناردن، ڕەوانەکردن ف فرستادن.

**هەناردنەوە:** دوبارە گەڕاندنەوە ف بازفرستادن.

**هەناردو:** ڕەوانەکراو ف فرستاده.

**هەنـاردی:** ۱) هەناردو؛ ۲) ناردی، ڕەوانەی کرد: (میر بەسەت میننەت **هەنـاردی** ئێستـرێکی زوُت‌و قوُت/ چوارپـەلی سست‌و سەقـەت ئەندامی هەر وەك عەنکەبوُت) «شێخ‌ڕەزا» ف ۱) فرستاده؛ ۲) فرستاد.

**هەنـارە:** گونـدێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**هەنـاری:** ۱) ڕەوانـەکـراو، ناردراو؛ ۲) بەڕەنگی دەنکی هەنـار ف ۱) فرستاده؛ ۲) بەرنگ دانهٔ انار.

**هەنارێ:** دارهەنار ف درخت انار.

**هەناسکەبڕکێ:** تەنگەنەفەسی ف نفس تنگی.

**هەناسکەبڕێ:** هەناسکەبڕکێ ف نفس تنگی.

**هەناسکەبڕێ:** هەناسکەبڕکێ ف نفس تنگی.

**هەنـاسـە:** فوُێ که گیاندار هەڵی‌دەمژێ‌و دەیداتەوەدەرو هەر بەوهەوایە دەژی، پشوُ، پشی ف نفس، دم.

**هەناسەبڕکە:** هەناسکەبڕکێ ف نفس تنگی.

**هەناسەبڕکێ:** هەناسکەبڕکێ ف نفس تنگی.

**هەناسەبڕاو:** خنکاو ف خفه‌شده.

**هەناسەدان:** نەفەس کێشان ف نفس کشیدن.

**هەناسەدانەوە:** نەفەس گەڕانەوە ف بازگشت نفس، بازدم.

**هەناسەدەرهاتن:** نەفەس کێشان، هەناسەدان ف نفس کشیدن.

**هەناسەسارد:** برێتی لە خاکەسەرو بێکەس ف کنایه از بینوا و بیچاره.

**هەناسەسوار:** پشوُسوار ف تنگ نفس.

**هەناسەکێشان:** پشوُدان، نەفەس کێشان، هەناسەدان ف نفس کشیدن.

**هەنـاسـەهـەڵ کێشـان:** نەفەسی خەمێ دان، ئاخ‌و ئاهـ گوتن ف آه کشیدن از غم.

**هەناف:** دەروُن، هەرچی لەناو زگایە ف احشاء.

**هەناف‌ڕەش:** دڵ‌پیس ف بدنهاد.

**هەنـاو:** ۱) ناو، جەرگ‌و ناو؛ ۲) ورە، زراو، غیرەت ف ۱) احشـاء؛ ۲) زهره، شجاعت.

**هەنبانە:** پێستی گوُراوی بزن‌و مەڕ کە دەیکەنە دەفری شتومەك، هەمانە، هەمبان، هەمبانە ف انبان.

**هەنبانەبۆرینە:** هەمبانەبۆرینە ف نگا: هەمبانەبۆرینە.

**هەنبانەگۆرینە:** هەمبانەبۆرینە ف نگا: هەمبانەبۆرینە.

**هەنتش:** بەلەز وەرە، زوُکە ف زودباش.

**هەنتش‌مەنتش:** پەلەبکە بەهرە دەبینی ف زودباش به نفع توست.

**هەنتـەش:** لەڕوی، حوزوُر: (دهـەنتـەشا وی دە ئەز نەشێم بێژم) ف حضور، محضر.

**هەنـج:** ۱) جۆرێ دورمـان، دورمـانێکی تایبـەتی؛ ۲) کورتەکیرێك لە نوُسینـدا بۆ نێوان‌دانـان «ـ»؛ ۳)دوُگەوْشتر ف ۱) نوعی دوخت؛ ۲) تیره؛ ۳) کوهان شتر.

**هەنجار:** هەموار، ڕێك: (ئەوشتە زۆر نا**هەنجارە**) ف مناسب.

**هەنجاڕ:** ئاموُر، ئەسپابی جوُت ف خیش.

**هەنجاندن:** ئەنجنین، وردکردن بە تیخ ف انجیدن، خردکردن با تیغ.

**هەنـج کرن:** پەیوەنـددان، گەیاندنەیەك، لێك‌گیر کردن ف بهم رساندن، بهم متّصل کردن.

**هەنجْن:** ئەنجْن، هنج ف انجیدگی، خردشدن با تیغ.

**هەنجنین:** وردکردن بە تیغ، ئەنجنین، هەنجاندن ف نگا: انجیدن، نگا: هەنجاندن.

**هەنجوُجك:** تۆمی هەرمێ ف تخم گلابی.

**هەنجوُرە:** هەنگوُرە، هنگوُر، ئێوارە درەنگێك ف عصرهنگام.

**هەنجولـەرە:** لەو گونـدانـەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**هەنجە:** ۱) شوێنی لێك‌هەڵ‌پچڕان؛ ۲) ترازاندن ف ۱) محلّ شکافتگی و ازهم بازشدن؛ ۲) نگا: ترازاندن.

**هەنجەت:** هنجەت، پەڵپ، بیانو، بەهانە ف بهانه.

**هەنجەل:** ناکام، نەجەل ف اجل.

**هەنجیر:** هەژیر ف انجیر.
**هەنجیرباوا:** میوەیەکی گەرمەسێرە درێژوکەو بەتێکوڵ ناوەکەی نەرمو شیرینە، مۆز ف موز.
**هەنجیرخۆرە:** باڵندەیەکە قاتڵی هەنجیرە ف پرنده‌ای انجیرخوار.
**هەنجیرە:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.
**هەنجیرەچیرور:** گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.
**هەنجیرەسورە:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.
**هەنجیرەوەرە:** باڵندەیەکە لە هەنجیرخواردنا ناوی کردوە ف پرنده‌ای انجیرخوار.
**هەند:** ۱) برێ، بەشێ: (**هەندێ** کەس سەیرن)؛ ۲) برێتی لە شەرمی ژن: (شەڵوارەکەی پێ‌کەندم بردی لە **هەندو** مەندم)؛ ۳) ئەوەند ف ۱) اند، بعض؛ ۲) کنایه از شرمگاه زن؛ ۳) آنقدر.
**هەنداف:** ۱) لای سەرو: (گەیمە **هەنداف** گوند)؛ ۲) بەرانبەر، روبەڕو ف ۱) بالاسر، طرف بالا؛ ۲) برابر، مقابل.
**هەندام:** ئەندام، لەش، ئازای بەدەن ف اندام، اعضاءِ بدن.
**هەنداو:** هەنداف ف نگا: هەنداف.
**هەندای:** هەند، ئەوەند ف آنقدر.
**هەندایین:** ئەوەندە، ئەوئەندازە ف این قدر.
**هەندر:** ئارامی، ئۆقرە ف آرامش، سکون.
**هەندران:** ئۆقرەگرتن ف آرام شدن.
**هەندرخان:** ناف، جەرگو ناو ف احشاء.
**هەندرو:** ۱) ژوری ماڵەوە، ئەندەرونی؛ ۲) ناو هەرشتێ ف ۱) اندرونی خانه؛ ۲) تو، داخل.
**هەندرهۆ:** حندرحۆ، هەڵلادۆشە ف آلاکلنگ.
**هەندریان:** هەندران ف آرام گرفتن.
**هەندریای:** ئۆقرەگرتو ف آرام گرفته.
**هەندرێشن:** گیایەکی تام‌تیژی گەڵابلندە بۆ دەرمان دەشێ ف گیاهی است دارویی.
**هەندرێشە:** هەندرێشن ف نگا: هەندرێشن.
**هەندرین:** هەندران، هەندریان ف آرام گرفتن.
**هەندرێن:** چیایەکی بەناوبانگە ف نام کوهی در کردستان.
**هەندو:** ۱) کەڵتەکردنەوە، چاکردنەوەی هەرشتێ؛ ۲) هۆزێکە هەمیشە لە کۆچو کۆچباردان، دۆم ف ۱) مرمّت؛ ۲) نام عشیره‌ای است کوچ نشین.
**هەندۆ:** هەند ف نگا: هەند.
**هەندە:** ۱) ئەوەندە؛ ۲) هەر ئەوەیە ف ۱) این قدر؛ ۲) فقط همین است.
**هەندەر:** لاوە، دەرەوەی وڵات ف خارج از منطقه.
**هەندەران:** وڵاتانی دەرەوە ف کشورهای خارج.
**هەندەسە:** ئەندازە ف هندسه.

**هەندەف:** هەدەف، تەپۆڵکە ف تپهٔ کوچك.
**هەندەقۆ:** شەودەر، گیایەکە ف شبدر.
**هەندەك:** کەمێك ف اندکی.
**هەندەکۆ:** شەودەر، هەندەقۆ، گیایەکە بۆ لەوەڕی ماڵات خۆشە ف شبدر.
**هەندەگ:** بزمۆك، بزمك، دەمبێنی بێچو کە شیری دایکی نەمژێ ف دهان‌بند بچهٔ دام برای جلوگیری از مکیدن پستان مادر.
**هەندی:** ۱) هەنی، شوتی، شمتی، جەبەش، زەبەش؛ ۲) زیاد، فرە ف ۱) هندوانه؛ ۲) بسیار.
**هەندێ:** ۱) هەندەك؛ ۲) ئەندازە ف ۱) اندکی؛ ۲) اندازه.
**هەندێك:** هەندەك ف اندکی.
**هەندینا:** دوئەوەندە ف دوچندان، دوبرابر.
**هەنزار:** هەزار، هازار، دەچەلان سەت ف هزار.
**هەنزەل:** گوژاڵك، کاڵەکەمارانە ف هندوانهٔ ابوجهل.
**هەنژین:** رازان، راکشان ف درازکشیدن برای خواب.
**هەنسك:** ۱) نزگەرەی بەگریانەوە؛ ۲) هەناسە ف ۱) سکسکهٔ گریه؛ ۲) نَفَس.
**هەنسکەبڕکێ:** هەناسەبڕکێ، پشوسواربون ف نفس تنگی.
**هەنسکەبڕێ:** هەنسکەبڕکێ ف نفس تنگی.
**هەنك:** حەنەك، قسەی پێکەنین ف طنز.
**هەنکچی:** قسەسەیر ف لوده.
**هەنکوف:** بەرانبەر لە هەموشتێکا ف کاملاً باهم برابر، هم‌شأن.
**هەنکە:** هانکە، هەناسەسواری ف هن خسته.
**هەنکەهەنك:** هەنکەی زۆر ف هِن هِن.
**هەنکی:** هێندکۆکە، هەندەك ف اندکی.
**هەنکیان:** پشوسواری ف هِن‌هِن کردن.
**هەنگ:** ۱) مێشەنگف؛ ۲) کرمێکە لە پێستی ماڵاتی بەرزە دەدا؛ ۳) بەزمو کەیف؛ ۴) کۆمەڵێکی زۆر؛ ۵) گزیو فێڵو تەڵەکە؛ ۶) ناز، دەلالی ف ۱) زنبور عسل؛ ۲) کرمی است آفت گاو که به پوست زند؛ ۳) جشن و سرور؛ ۴) تودهٔ بسیار؛ ۵) نیرنگ و حقّه؛ ۶) نازو دلبری.
**هەنگا:** هەر ئیسە، ئەئێستا، نهو، هەنوکە، نوکە ف هم‌اکنون.
**هەنگافتن:** لەئامانج‌دان، ئەنگاوتن ف بەهدف زدن.
**هەنگاف:** ۱) شەقاو، لۆق؛ ۲) دەم، کات، وەخت ف ۱) گام؛ ۲) هنگام.
**هەنگامە:** هەراو هوریا ف هنگامه.
**هەنگانە:** باج لە هنگف ف باج ارباب از عسل.
**هەنگاو:** شەقاو، لۆق ف گام.
**هەنگاوتن:** ئەنگاوتن ف به هدف زدن.
**هەنگاونان:** بە هەنگاو بەرەوپێش‌چون ف گام برداشتن.
**هەنگاوهەڵێنان:** هەنگاونان ف گام برداشتن.
**هەنگباز:** فێڵزان، گزیکەر ف حقّه‌باز.
**هەنگبڕ:** کەسێ کە هنگف لە خەڵێف دەچنێتەوە ف عسل‌چین از کندو.
**هەنگ‌خۆرکە:** رنگرێژە، رەنگاڵە ف پرندهٔ زنبورخوار.
**هەنگ‌خۆرە:** هەنگ‌خۆرکە ف پرندهٔ زنبورخوار.

**هەنگـدان:** ١) خەلّیف، پلوُرە؛ ٢) پوُرەدان ف ١) کنـدوی عسل؛ ٢) برآمدن نسل جوان زنبور.

**هەنـگـدوّز:** کەسێ کە بەشـوێن هەنگدا دەگەڕێ تا پەیدای کات ف جستجوگر «هەنگ»، جویندۀ نسل نوین زنبور.

**هەنگّف:** هنگّف، هەسەلّ ف عسل.

**هەنگّقار:** ئەنگوّری، سەرلە نێوارە ف عصرهنگام.

**هەنگّفین:** هەسەلّ، هنگّف ف عسل.

**هەنگّفینوك:** گیایەکە ف گیاهی است.

**هەنگ کرن:** ١) نازکردن؛ ٢) فێلّ کردن ف ١) نازکردن؛ ٢) حقّەزدن.

**هەنگّلّ:** ١) بن باخەلّ؛ ٢) دەسکی دەفر ف ١) زیر بغل؛ ٢) دستۀ ظرف.

**هەنگّلەشەلە:** لەسەر لاقێك ڕۆیشتن و لاقێك هەلّ گرتن ف لی لی رفتن.

**هەنگمین:** هەنگف، هەنگفین ف عسل.

**هەنگو:** ئەنگوّ، ئێوە ف شما.

**هەنگـوان:** ١) ئەنگـوان، پێکـان؛ ٢) گیایەکە، هەلّز ف ١) هدف قرار گرفتن؛ ٢) گیاه انجدان.

**هەنگوچك:** ئەنگوچك، لەوەندی ف آستین بلند.

**هەنگوّچنە:** مێش خوّرە، ڕەنگالّە ف پرندۀ زنبورخوار.

**هەنگوُر:** ترێ ف انگور.

**هەنگوّرە:** هەنگقار، ئەنگوّرە ف عصرهنگام.

**هەنگوُرە:** ١) جوّرێ کاکلّەموشان؛ ٢) مێشەنگوینی خراپ؛ ٣) ترێ ف ١) نوعی عنکبوت؛ ٢) زنبور عسل قلّابی؛ ٣) انکور.

**هەنگـوری:** جوّرێ گەمـە، دەگەلّ مەنگـوری دەلّێن: (**هـەنگـوری** مەنگوری) ف نوعی بازی.

**هەنگـوژە:** ١) جەوی، جیوەی دار و گیا؛ ٢) شیرەی گیای هەلّز ف ١) انگم؛ ٢) شیرۀ گیاه انجدان.

**هەنگوست:** ئەنگوست، قامك، تبل، پل، تلی، تلهی، کلك ف انگشت.

**هەنگوستیل:** ئەنگوستیلە ف انگشتری.

**هەنگوستیلك:** ئەنگوستیلە ف انگشتری.

**هەنگوّلّ:** ١) هەنگّلّ؛ ٢) پاچە ف ١) نگا: هەنگّلّ؛ ٢) پاچۀ حیوان.

**هەنگولیسك:** ئەنگوستیلە، ئەوستیلە ف انگشتری.

**هەنگون:** هەنگف، هەنگفین، هەسەلّ ف عسل.

**هەنگوُین:** هەنگف، هەنگفین، هەسەلّ، هەنگون ف عسل.

**هەنگـەبـوّلـە:** هەنگوُرە ، مێشەنگوینی دەغەلّ کە هەنگوُین ناکا ف زنبور بی‌عسل.

**هەنگەچینە:** هەنگ خوّرکە ف پرندۀ زنبورخوار.

**هەنگەڕەشکە:** هەنگەبوّلّە ف زنبور بی‌عسل.

**هەنگـەژالّ:** ١) خەلّیف، پلوُرە؛ ٢) مێشـەنگـوین لە قەلّشتـەبـەردی شاخـدا؛ ٣) گونـدێکە لە کوردستان ف ١) کندوی زنبور؛ ٢) گروه زنبور عسل در شکاف صخره؛ ٣) نام دهی درکردستان.

**هەنگەژالّە:** هەنگ، مێشەنگوین ف زنبورعسل.

**هەنگەشەلە:** هەنگّلەشەلە ف لی لی راه رفتن.

**هەنگەشەلێ:** هەنگّلەشەلە ف لی لی راه رفتن.

**هەنگـەلان:** هەنگەژالّە، جێگەی مێشەنگوین لەشاخدا ف جای زنبور عسل در شکاف صخره.

**هەنگەلاّن:** هەنگەلان ف نگا: هەنگەلان.

**هەنگەمالّ:** شانەهەنگوین ف شانۀ عسل.

**هەنگەمین:** هەنگف، هەنگمین، هەنگوُین ف عسل.

**هەنگەوان:** بەخێوکەری هەنگ ف پرورش دهندۀ زنبور عسل.

**هەنگەوچنە:** هەنگەچینە ف پرندۀ زنبورخوار.

**هەنگەون:** گوێنی، گەوْن ف گوْن.

**هەنگەوێ:** گوندێکە لە کوردستان ف روستایی در کردستان.

**هەنگی:** ئەودەم، ئەوسا ف آندم، آنگاه.

**هەنگیر:** هەنگوُر، ترێ ف انگور.

**هەنگێزە:** ١) قولّفی دەسکی خورجو جەوالّ؛ ٢) کێلّی قەبـر؛ ٣) بن کێلی قەبـر ف ١) دستگیرۀ جوال و خورجین؛ ٢) سنـگ قبـر؛ ٣) زیرسنگ قبر.

**هەنگین:** ١) هەنگوُین؛ ٢) ئەوسا، ئەودەم، هەنگی ف ١) عسل؛ ٢) آنگاه.

**هەنگینێ:** ئەوساکە ف آنگاه.

**هەنـو:** ١) ئێوە هەتـانن: (ئەوانە دەلّێن مەڕو بزنمان نیە ئێوە **هەنو**)؛ ٢) رابـردەی بەمـانـا پیاسـاوین و بەدەست مالّین؛ ٣) فەرمـان بە دەست پێداهێنان ف ١) شما آنها را دارید؛ ٢) ماساژ داد؛ ٣) ماساژ بده.

**هەنوّ:** ١) ئەم ئەندازە؛ ٢) ئەمە ف ١) این قدر؛ ٢) این.

**هەنـوکـە:** ١) نهـوّ، ئێستە، نوها؛ ٢) واك، وانێك، تشت، هەرامە ف ١) اکنون؛ ٢) آن چیز.

**هەنوُن:** تێ ساوین و توند بەدەست مالّین: (پشتت بە هەتوان **بهەنو**) ف ماساژدادن دارو بر پوست.

**هەنـوُنێ:** وتـەیەکی جادوگەرانەیە لە چیروّکی کوّندا: (**هەنوُنێ** مەنوُنێ خەزێنەی پاشام بەقوُنێ) ف کلمۀ جادویی در داستانهای قدیمی.

**هەنوُیر:** هەنگوُر، ترێ ف انگور.

**هەنوین:** هەنگوین، هەنگف ف عَسَل.

**هەنە:** ١) هەڤی؛ ٢) هەمانە، دێریم؛ ٣) هەن، ماون؛ ٤) خەنە، هونە؛ ٥) دارێکی ئەستوُر لە دەسگای تەوندا ف ١) هو؛ ٢) داریم؛ ٣) هستند؛ ٤) حنا؛ ٥) وسیلەای چوبی در دارقالی.

**هەنەر:** ١) هونەر؛ ٢) دەرەوە ف ١) هنر؛ ٢) بیرون، خارج.

**هەنەران:** هەندەران ف کشورهای خارج.

**هەنەزا:** زاروّی هەڤی ف هووزادە.

**هەنەزاگ:** هەنەزا ف هووزادە.

**هەنەژالە:** هەنگ ف زنبور عسل.

**هەنـەفی:** ١) مریشکـاوی، بالّـدارێکە لە تیرەی مراوی؛ ٢) پەیڕەوی مەزهەبی ئیمام ئەبوحەنیفە ف ١) پرندەای از خانوادۀ مرغابی؛ ٢) پیرو مذهب ابوحنیفە.

**هەنـەك:** ١) هەنّك، حەنەك، قسەی گالّتەو گەپ؛ ٢) چەنە ف ١) طنز،

شوخی؛ ٢) چانه.
**هەنەکچی:** قسەخۆش، گاڵتەچی ف شوخ و لوده.
**هەنەکە:** هەندەکۆ، شەودەر ف شبدر.
**هەنەکی:** گاڵتەچی، هەنەکچی ف شوخ و لوده.
**هەنهۆ:** ١) هەر ئێستە؛ ٢) دەستبەجێ ف ١) هم‌اکنون؛ ٢) فوراً، بی‌درنگ.
**هەنهە:** هەنهۆ ف نگا: هەنهۆ.
**هەنەهەپسێ:** دەم‌لەدەم‌نان ف نزاع لفظی، مشاجره.
**هەنەهەن:** نخەنخ، هەناسەسواری ماندوو ف هن‌هن خسته.
**هەنی:** ١) شفتی، جەبەژ، شمتی، شووتی؛ ٢) دۆن، بیر و برۆا؛ ٣) رۆژائین، جوعمە، هەینی؛ ٤) ئێستـاش، تائێستاش؛ ٥) ئیتر، ئیدی؛ ٦) لەپڕ، لەنکاو؛ ٧) تویڵ، ئەنی، ناوچـاوان؛ ٨) کانی، سەرچاوە؛ ٩) بازێك، هەندێك؛ ١٠) بتر، زیاتر ف ١) هندوانه؛ ٢) عقیده و مرام؛ ٣) آدینه؛ ٤) هنـوز؛ ٥) دیگر؛ ٦) ناگهانی، یکهو؛ ٧) پیشانی؛ ٨) چشمه؛ ٩) اندکی؛ ١٠) بیشتر.
**هەنێ:** ئاوها ف اینچنین.
هەنیسك: نزگەرەی بەگریانەوە، خیسك ف سکسکهٔ گریه.
**هەنیشخ:** ئانیشك، هەنیشك، جومگەی نێوان زەندو قۆڵ ف آرنج.
**هەنیشك:** ئانیشك، هانیشك ف آرنج.
**هەنیشکە:** ئانیشکە ف لولهٔ زانویی.
**هەنین:** هەنوون، پێداساوینی مەلحەم ف ماساژدادن دارو بر پوست.
**هەنێن:** بەوجۆرە، ئاوهایی، ئاواناوایی ف این طور.
**هەنیە:** تویڵ، ئەنی، ناوچاوان ف پیشانی.
**هەو:** ١) جار، کەڕەت، هەل؛ ٢) هەر ئەوەندەو بەس، چیترنا: (ئەوەندەت دەدەمێ و هەو ئیدی مەیەوە، دوودەقیقـەم لابـەو هەو)؛ ٣) ئەو، هۆوە: (هەوەو کەسی‌تر نیە)؛ ٤) وشەی سەیرمان بۆ زیان: (هەو لێم ڕژا)؛ ٥) گەڕانـەوە؛ ٦) فێڵ، حیلە؛ ٧) کێم و زوخ؛ ٨) وتـەی ڕاوکـەران لە جەنگەی نێچیر دانـەبەر: (هەوی لێ‌کرد)؛ ٩) شالاو، پەلامار؛ ١٠) شەپلە لە ئەنـدامی لەش؛ ١١) شت‌دیتن لەخەوا، خەون؛ ١٢) خەو، نوسن؛ ١٣) پێخەنین، کەن ف ١) بار، دفعه؛ ٢) بس، همین؛ ٣) او؛ ٤) حرف تعجّب؛ ٥) بازگشت؛ ٦) نارو، حیله؛ ٧) ریم و چرك زخم؛ ٨) تکیه‌کلام شکارچیان هنگام تعقیب شکار؛ ٩) حمله؛ ١٠) لمس شدن اعضاء بدن، فلج شدن؛ ١١) خواب دیدن، رُویا؛ ١٢) خواب؛ ١٣) خنده.
**هەوا:** ١) با، بێ؛ ٢) بڵندایی لە زەوین بەرزتر؛ ٣) عاسمان؛ ٤) ئیشتیاو تاسـە؛ ٥) فیز، بادی‌هەوایی، دەعیە؛ ٦) قامی گۆرانی: (هـەوایەکی خۆشمان بۆ بڵێ)؛ ٧) کێم، زوخاو؛ ٨) کەم: (هەوایەك لامان دانیشە، هەوایەك گەورەتـرە)؛ ٩) باکـردن، ئەستـووربوون ف ١) باد؛ ٢) جوّ زمین؛ ٣) آسمـان؛ ٤) اشتیاق و آرزو؛ ٥) تکبّر؛ ٦) آهنگ ترانه؛ ٧) ریم و چرك زخم؛ ٨) اندك؛ ٩) آماس.
**هەوابڕ:** بریتی لە دیوارو خانوی بڵند ف کنایه از دیوار و خانهٔ بلند.
**هەوابـوون:** لەکـارکـەوتنی ئەندامێك لە ئەندامانی لەش ف ازکارافتادن عضوی از اعضاء بدن.
**هەواپێو:** ئامرازی ئەزموونی توندی‌و سستی با ف بادسنج.
**هەواجیوە:** ڕەگی دارێکـە بۆ دەرمـان دەشێ ف ریشهٔ درختی است که مصرف دارویی دارد.
**هەواخوا:** دژدار، لاگر ف هواخواه.
**هەواخوڕ:** کون لە دیواردا بۆ باهاتنە ناوماڵەوە ف بادگیر.
**هەواخۆش:** جێگەی سازگار ف جای خوش آب وهوا.
**هەوادار:** ١) ئەڤیندار، عاشق؛ ٢) بەدەعیە، بادی‌هەوا، بەفیز؛ ٣) جێگەی هەواخۆش؛ ٤) لاگر، هەواخوا؛ ٥) دومەڵی بەکێم‌و زوخ ف ١) عاشق؛ ٢) متکبّر؛ ٣) جای خوش آب وهوا؛ ٤) طرفدار؛ ٥) ریم و چرك دُمَل.
**هەوادان:** حەوادان، بەرەوژوور ئاویتن ف پرت کردن به بالا.
**هەوادایش:** هەوادان ف پرت کردن به بالا.
**هەوار:** ١) هاوار؛ ٢) وار، زۆزان، زستانەوار ف ١) فریاد؛ ٢) ییلاق.
**هەوارچوون:** ڕۆیشتن بۆ بانەمەڕان ف ییلاق رفتن.
**هەوارچی:** کۆچەر، خێڵەکی، ڕەوەند ف ییلاق‌رو، کوچ‌نشین.
**هەوارفـەڕ:** لەو گونـدانـەی کوردستـانـە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.
**هەوارکـردن:** ١) هاوارکـردن؛ ٢) چوونەکوێستان ف ١) فریادزدن؛ ٢) رفتن به ییلاق.
**هەوارگە:** وارگە، جێگەی ژیان لە کوێستان ف خیمه‌گاه در ییلاق.
**هەوارۆ:** ١) ئەی هاوار؛ ٢) ناوی هەوایەکی گۆرانیە ف ١) ای داد؛ ٢) نام آهنگی است.
**هەوارە:** ١) هاوار، وتـەیەکـە بۆ پەنـابردن بە خەڵك لە لێ‌قەوماندا؛ ٢) قامێکە، هەوایەکە ف ١) به دادم برسید؛ ٢) آهنگی است.
**هەوارەبـەرزە:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بە عسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.
**هەوارەبێ:** گوندێکە لە کوردستان ف نام دهی در کردستان.
**هەوارەکـوون:** گونـدێکـە لە کوردستـان بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.
**هەواری:** چادری زۆر گەورە ف خیمهٔ بزرگ.
**هەواکـرن:** ١) ماسینی لەش، ئەستـووربوونی ئەنـدام لە نەخۆشی؛ ٢) تووڕانـدنـە زوڕناو بلوێر و ئامرازی‌تر ف ١) آماسیدن اعضاء بدن؛ ٢) دمیدن در آلات موسیقی بادی.
**هەواکێشان:** باکردن‌و ئەستووربوونی برین ف آماسیدن زخم.
**هەواگا:** جێگەی بڵندی سازگار ف جای بلند خوش آب و هوا.
**هەواڵ:** ١) خەبەر؛ ٢) ئاواڵ، دۆست؛ ٣) چلۆنەتی حاڵ‌و ئەحواڵ ف ١) خبر؛ ٢) رفیق؛ ٣) احوال.
**هەواڵ پرس:** ١) خەبەرپرس؛ ٢) کەسێ کە حاڵی یەکێ دەپرسێ ف ١) جویاشدن خبر؛ ٢) احوالپرسی.
**هەواڵ پرسـی:** ١) پرسـینی خەبـەر؛ ٢) پرسینی حاڵی کەسێ ف ١) جویای خبر؛ ٢) احوال‌پرس.
**هەواڵ پرسین:** هەواڵ‌پرسی ف نگا: هەواڵ‌پرسی.

**هەواڵدەر:** خەبەردەر ف خبرگزار.

**هەواڵ منداڵ:** پەردەی منداڵدان، پزدان ف جفت نوزاد.

**هەواڵە:** ١) حەواڵە، ناردنی پارە بە پۆستەدا؛ ٢) بەرهەیوان، پێش‌پەنجەرە ف ١) حوالە؛ ٢) بالکن.

**هەوان:** ١) هەمبـان، هەنبـان؛ ٢) رەبـەن، سەڵت، سپاتە، بێ‌ماڵ ف ١) انبان؛ ٢) مجرّد بی خانمان.

**هەواناس:** پسپۆر لە چلۆنایەتی کەش‌دا ف هواشناس.

**هەواناسی:** پسپۆری لە باری کەش‌دا ف هواشناسی.

**هەوانتە:** ١) ئاوانتە، مفتە؛ ٢) بەخۆڕایی، بێ‌فایدە ف ١) مفت، رایگان؛ ٢) بیهودە.

**هەوانتەچی:** ئاوانتەچی ف باج سبیل‌گیر، مفتخور.

**هەوانچە:** هەنبانۆکە ف انبانچە.

**هەوانە:** هەنبانە ف انبان.

**هەواوان:** گونـدێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**هەوای:** لاسا ف تقلید.

**هەوایش:** پێکەنین، کەن، پێکەنین، خەنە ف خندە.

**هەوای‌ما:** زوانی ئێمە ف زبان ما.

**هەوایی:** ١) ئەڤینداری لەدڵداریدا شێت‌بوگ؛ ٢) نهۆمی باڵاخانە؛ ٣) گەلـلایی و گوێ‌نەدەر ف ١) عاشق والـه و شیدا؛ ٢) طبقـهٔ بالایی ساختمان؛ ٣) دبنگ.

**هەوبوُن:** ئیتر نەهاتنەوە ف یکبارە رفتن، رفتن بی‌بازگشت.

**هەوبەر:** بەری جلك، هاسەر ف آستر.

**هەوت:** حەفت ف هفت.

**هەوتا:** هاوتا، ئامتا ف همتا.

**هەوتاش:** سەرۆکی ئێشك‌گران ف سرکشیك.

**هەوتانایش:** بوێری، ئازایەتی ف شجاعت.

**هەوتای:** حەفتێ، حەفتا ف هفتاد.

**هەوتاین:** حەفتامین ف هفتادمین.

**هەوت‌سەی:** حەوسەت ف هفتصد.

**هەوتـك:** گڵێنـەیەك کە خواردنی بۆ کوُچکـا تێ‌دکـەن، دەفری گڵینی خۆراکی سەیان ف ظرف گلین ویژهٔ خوراك سگ.

**هەوت‌لا:** حەوقات، حەوقاس ف نگا: حەوقات.

**هەوتن:** حەوتەم ف هفتم.

**هەوتوُیش:** بەسەرهاتی ناخۆش ف پیشامد ناگوار.

**هەوتە:** هەفتە، حەوتو ف هفتە.

**هەوتێس:** حەڤدە ف هفدە.

**هەوجار:** ئاموُر، ئەسپابی جوُت ف خیش.

**هەوجە:** حەوجە، نیاز ف احتیاج.

**هەوجەدار:** ئاتاج، دەسکورت ف محتاج.

**هەوچی:** فێڵباز، دەست‌بڕ ف ناروزن، حقەباز.

**هەوخستن:** لێك‌کۆکردنەوە، کردنەیەك ف دورهم جمع کردن.

**هەود:** ١) رکە، بێرکم، قەفەز؛ ٢) حەوز ف ١) قفس؛ ٢) حوض.

**هەودا:** ١) تا، تاڵ، داو؛ ٢) چەند وشەیەك کە بە یەك هەناسە دە گوترێ ف ١) تار، تارنخ و موی؛ ٢) کلامی کە با یك نفس گویند.

**هەودان:** پەلاماردان ف حملەکردن.

**هەودو:** هەڤدو، ئێکتر ف همدیگر.

**هەودەك:** هەود، رکە، بێرکم، قەفەز ف قفس.

**هەودەل:** ١) شۆربای لە وردەساوارو ئارد بۆ چێڵی تازەزاو؛ ٢) داروُکەی نەرمی سەری شوُشـە، تەپـەدوُر ف ١) نوعی آش برای گاو زائو؛ ٢) چوب پنبە.

**هەور:** ١) مژی زۆر بەرزەوەبوُگ کە بارانی لێ دەڕژێتەخوار، عەور؛ ٢) شتێکـی زۆر نەرمـی کونکونــە بۆ دەســتو چاوشتن کە بە کەفی سابوُنـەوە دەکـار دەهێنرێ؛ ٣) گۆمی قوُڵ؛ ٤) مێرگۆڵەی پچوُك لە نواڵی چیادا ف ١) ابـر؛ ٢) ابـرمردە، اسفنج؛ ٣) گودال عمیق؛ ٤) مرغزار کوچك در کوهستان.

**هەوڕ:** ئیر بار، دەفری سواڵەتی ف ظرف سفالی.

**هەوُر:** هەنگوُر، ترێ ف انگور.

**هەورا:** برچی، برسی، نێز ف گرسنە.

**هەوراز:** رکە، بەرەوژوُرە ف سر بالایی.

**هەوڕاز:** هاوڕاز، هەمڕاز ف همراز.

**هەورازی:** سەربەرەوژوُرە ف سر بالایی.

**هەورامان:** مەڵبەندێکی شاخاوی‌وچڕە لای پاوەو سەربە شاری سنەی کوردسان ف منطقەای کوهستانی در کردستان، اورامان.

**هەورامانی:** ١) خەڵکی هەورامان؛ ٢) شێوەی کوردی هەورامان ف ١) اهل منطقهٔ «هەورامان»؛ ٢) لهجهٔ کردی «هەورامان».

**هەورامی:** ١) خەڵکی مەڵبـەندی هەورامان؛ ٢) شێوەیەکی تایبەتی لە زمانی کوردیدا ف ١) اهل منطقهٔ «هەورامان»؛ ٢) لهجهٔ کردی اورامی.

**هەوران:** ١) هەڤران، سپیندار، ئەسپیندار؛ ٢) عاسمانی بەهەور ف ١) سپیدار، چنار؛ ٢) آسمان ابری.

**هەورایی:** ١) برچیتی، برسیاتی؛ ٢) عاسمانی بەهەور ف ١) گرسنگی؛ ٢) آسمان ابری.

**هەوربردو:** میوەو دەخڵێ کە لە هەور زیانی دیوە ف میوە و غلّهٔ ابرزدە.

**هەوربردە:** هەوربردو ف میوە و غلّهٔ ابرزدە.

**هەورس:** داری عەڕعەڕ ف درخت عرعر.

**هەورك:** هەور، ئەو شتەنەرمەی کونکونە کە بۆ شت‌شوتن دەکاردەکرێ ف ابراسفنجی.

**هەورگەر:** ئیر بارگەر، کەسێ کە دەفری سواڵەت چێ‌دەکا ف سفالگر، کوزەگر.

**هەورنگ:** برینگ ف دوکارد پشم‌چینی.

**هەوروبا:** جۆرێ بەری دارمازو ف نوعی ثمر مازوج.

**هەوروهەڵا:** رۆژی بارانی‌و هەور ف هوای بارانی و ابری.

**هەورە:** رەنگی سورمەیی ف رنگ سرمەای.

**هەورەبـان:** ۱) پلەکـانی سەردایـۆشراو بۆ چوُنە سەربان، کۆماج؛ ۲) ژوُری چکـۆڵـە لەسەربان بۆ کەل‌وپەل ف ۱) راه پلهٔ سرپوشیده تا پشت‌بام؛ ۲) اتاقك كوچك بر بام خانه.

**هەورەبروسکە:** بروسکەی هەور ف رعد وبرق.

**هەورەتریشقە:** هەورەبروسکە ف رعدوبرق.

**هەورەمیش:** ئاوریشم ف ابریشم.

**هەوری:** ۱) پارچەیەکی ئاوریشمی ناسکە بۆ سەرپێچی ژنان‌و زۆبەند بەکاردێ؛ ۲) هەوری دەست‌پێ‌شۆرین، هەور؛ ۳) هەفوُری، نێری، تەگەی دوسـاڵـەو باڵاتـر، هەڤۆری؛ ۴) دنیای بەهەور، ئەساو ف ۱) پارچهٔ ابریشمی کلاغی؛ ۲) ابرمرده، ابراسفنجی؛ ۳) تکه، شاك؛ ۴) آسمان ابری.

**هەورێ:** ۱) چیایەکـە لە کوردستـان؛ ۲) لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف ۱) نام کوهی است؛ ۲) روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**هەوڕێ:** ۱) هاوڕێ؛ ۲) هەواڵ ف ۱) همراه؛ ۲) رفیق.

**هەورێبارانێ:** هەورێ کە باران دەبارێنێ، هەوری پڕ ف ابر غلیظ و بارانی.

**هەورێپڕ:** هەورێ کە باران دەبارێنێ ف ابر غلیظ و بارانی.

**هەورێتەنك:** سوُکەڵەهەور ف ابر رقیق و مختصر.

**هەورێڕەش:** هەوری پڕ و توند ف ابر پر پشت و غلیظ.

**هەوریس:** داری عەڕعەڕ ف درخت عرعر.

**هەورێشم:** هەورەمیش، ئاوریشم ف ابریشم.

**هەورێشە:** کەروێشـك، خەروێ، کەورێشـك، کێـروُشك، هـەروێ ف خرگوش.

**هەورینـگ:** ۱) ئاورینگ، پڕیشکەئاور؛ ۲) برینگ، هەورنگ ف ۱) شراره؛ ۲) دوکارد.

**هەوز:** ۱) سەوز، کەسك؛ ۲) حەوز، بڕکە ف ۱) سبز؛ ۲) برکه.

**هەوزەك:** ئاماڵ‌کەسك، ئاماڵ‌سەوز ف سبزفام.

**هەوزین:** کەسکایی، سەوزایی ف سبزینگی، سبزرنگی.

**هەوزینگ:** ئاویلکەدان، گیانەڵاو ف دم مرگ.

**هەوْس:** فێربوُن، راهاتن، هەڤۆت ف تعلیم، یادگیری.

**هەوسار:** هەفسار، ئەوسار ف افسار.

**هەوْساندن:** فێرکردن، راهێنان، لە کاردا خاراندن ف تعلیم دادن.

**هەوسین:** خەریکی فێربوُن بوُن، فێرەکاربوُن ف یادگرفتن.

**هەوش:** ۱) بزنی سپی‌و ڕەش؛ ۲) حەوش، حەسار؛ ۳) باخچە؛ ۴) زنج، تامان لە دار بۆ ئاژەڵ لە دەرەوە ف ۱) بزخلنگ؛ ۲) حیاط؛ ۳) باغچه؛ ۴) نردهٔ چوبی برای نگهداری دام.

**هەوشار:** ۱) وڵاتێکە لە کوردستان؛ ۲) پەسنی سەگی زۆر باش: (سەگی هەوشار)؛ ۳) گیاگەسك ف ۱) ناحیه‌ای در کردستان؛ ۲) صفت سگ خوب؛ ۳) گیاه جارو.

**هەوشـان:** ۱) گیایەکە زۆر تاڵ؛ ۲) سەردەمی لەدەرەوەنوستن لە مانگی پوُشپـەڕو گەلاوێژدا؛ ۳) گیاگەسك، هەوشار ف ۱) گیاهی است تلخ مزه؛ ۲) موسم بیرون از خانه خوابیدن در تابستان؛ ۳) گیاه جاروچزه‌ای.

**هەوشە:** ۱) پەچەمەڕ؛ ۲) حەسار، حەوشە ف ۱) آسایشگاه گله درشب، شبغاز؛ ۲) حیاط.

**هەوشـەنـگ:** ۱) ئاژەڵی شیردەری بێچـومـردو؛ ۲) مەیدانی یاری، گۆڕەپانی وەرزە، دەشتی جێ‌گەمە ف ۱) بز و میش بچه‌مردهٔ شیرده؛ ۲) استادیوم ورزشی.

**هەوشین:** ۱) دەردی شیر وشك‌کردن؛ ۲) گیایەکە لە تیرەی پنگ ف ۱) بیماری شیرخشك کردن؛ ۲) گیاه آویشن.

**هەوشینان:** کوێستانێکی بەناوبانگە لە کوردستان ف ییلاقی است مشهور.

**هەوق:** ۱) پلەی نەردیوان؛ ۲) دوکانی سەوزی‌چاندن؛ ۳) پەنگاوی ئاو؛ ۴) تاق، تاقی گومبـەزی، گومبەزی بەتاق ف ۱) پلهٔ نردبان؛ ۲) کرد مستطیل شکل سبزیکاری؛ ۳) تراکم آب؛ ۴) سقف گنبدی.

**هەوك:** ئەوك، قورگ ف گلو.

**هەوکردن:** ۱) قرتماغە پەڕینەسەر برین؛ ۲) کێم‌و زوُخاو لە برین هاتن ف ۱) خشـك ریشـه روی زخم ایجادشدن؛ ۲) ریم و چرك از زخم بیرون آمدن.

**هەوگ:** هەوك، ئەوك ف گلو.

**هەوْگ:** هەوە، هەڤی، هەنە ف هوو.

**هەوگیان:** ژنی برای مێرد، جاری ف زن برادر شوهر، جاری.

**هەول:** ۱) هاولە، باش، هێژا؛ ۲) ئازا ف ۱) خوب؛ ۲) شجاع.

**هەوڵ:** ۱) تەقالا، کۆششت، حەول؛ ۲) وڕ، گێژو سەرسام ف ۱) کوشش؛ ۲) سراسیمه.

**هەوڵدان:** تەقالادان، خەبات‌کرن، خەبتین ف کوشش کردن.

**هەول کەردش:** چاکەی‌کرد، پیاوەتی‌کرد ف نیکی کرد.

**هەولۆ:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**هەوڵـە:** ۱) ئاوڵە، خورێکە، خورویلکە؛ ۲) بشتەماڵ، بارجەی کوڵکنی خۆوشك‌کردنەوە ف ۱) آبله؛ ۲) حوله.

**هەوڵەزلزلە:** ئاگرە، زیپکەی ئاگرە، ئاورە ف آتش پارسی، نوعی جوش.

**هەولەکی:** دەست‌پاچە، حەپەساو ف دستپاچه.

**هەولی:** جوانوئەسپی یەکساڵە ف کُرّه‌اسب یکساله.

**هەولێر:** ۱) یەکجار باش، لە باشیش باشتر؛ ۲) شارێکە لە کوردستان ف ۱) بسیار خوب، بهترین؛ ۲) شهری درکردستان.

**هەون:** ۱) کەیف‌و ئاهـەنـگ، خۆشی‌و شادی؛ ۲) خەو ف ۱) شادی، سرور؛ ۲) خواب.

**هەونا:** ۱) دوبارە، دیسان؛ ۲) بێدەنگ‌بوُن؛ ۳) خەوتن ف ۱) دوباره؛ ۲) ساکت شدن، سکوت؛ ۳) **خوابیدن.**

**هەونبەبیش:** خەولێ کەوتن ف بەخواب رفتن.

**هەوندەبیش:** خەون‌دیتن ف خواب دیدن.

**هەونڕەمـیایش:** خەوزڕان، خەوڕەوین ف خواب از سر پریدن،

بدخواب شدن.

**هەونسڤك:** خەوسوُك ف سبك خواب.

**هەونڤیانایش:** خەونديتن ف خواب ديدن.

**هەونگران:** خەوگران ف سنگين خواب.

**هەونـو:** گونـدێكـە لە كوردستان بەعسی وێرانی كرد ف از روستاهای ویران شدهٔ كردستان توسط بعثیان.

**هەونیایش:** تواشاكردن ف تماشاكردن.

**هەونێسەڕان:** برێتی لە خەوی زۆر درێژخایەن ف كنایه از خواب طولانی.

**هەوە:** ١) ئەنگۆ، هنگ، ئێوە؛ ٢) هەڤی، هەنە؛ ٣) هەتانە؛ ٤) خۆیەتی؛ ٥) ئیتر بەسە؛ ٦) دروشم، نیشانەی تایبەتی؛ ٧) هالاّو تینی گەرما؛ ٨) هەو، جار، دەفعـــە، كەڕەت ف ١) شمـــا؛ ٢) هوو؛ ٣) داريد؛ ٤) خودش است، همان است؛ ٥) ديگر بس است؛ ٦) علامت، آرم؛ ٧) بخارگرما؛ ٨) بار، دفعه.

**هەوەتـو:** مەلّبـەندێكی كوێستانە لە كوردستان ف ناحیەای سردسیر و كوهستانی دركردستان.

**هەوەخان:** ١) هەنە، هەڤی؛ ٢) كەیوانو ف ١) هوو؛ ٢) بانوی خانه.

**هەوەر:** پاڕانەوە، لالاّنەوە ف التماس.

**هەوەڕ:** هەوڕ، ئێر بار، دەفری سوالّەت ف ظرف سفالی.

**هەوەس:** ئیشتیا، ئارەزو ف آرزو، هوس.

**هەوەسار:** ژنی بەهەنە ف زن هوودار.

**هەوەساری:** هەڤینی ف هوو داشتن.

**هەوەسیاگ:** حەپەساو، واقوڕماو ف مبهوت و متحیّر.

**هەوەسیان:** حەپەسان، عەبەسان، واقوڕمان ف متحیّرشدن.

**هەوەڵ:** ١) ئێكەم؛ ٢) سەرەتا ف ١) اوّل، يكم؛ ٢) آغاز.

**هەوەڵ بەهار:** سەرەتای بەهار ف اوايل بهار.

**هەوەنگ:** ئاونگ، دەسكاونگ ف هاون.

**هەوهـەو:** ١) دەنگی سواران لەڕاودا؛ ٢) وتـەی سەیرمان ف ١) غلغلهٔ سواران در شكارگاه؛ ٢) كلمهٔ تعجّب.

**هەوی:** ١) هەنە، هەڤی، هەوە؛ ٢) مانگی لە عاسمان؛ ٣) كۆمەك لە كار؛ ٤) هـەوێك، چەلـێـك؛ ٥) مایـەی خلافـانـدنو خەریـك كردن، وەڕەزی شكێن، خەمڕەوێن ف ١) هوو؛ ٢) ماه، قمر؛ ٣) كمك دركار؛ ٤) يك بار؛ ٥) وسيلهٔ سرگرمی.

**هەوێ:** هەنە، هەڤی ف هوو.

**هەویا:** هومێد، هومێ ف امید.

**هەویان:** بەر بێلاّیی، سەكۆی سەرداپۆشراو لە بەردەركی ماڵ ف ایوان، تراس.

**هەوێبار:** هەوەسار ف هوودار.

**هەوێباری:** هەڤینی ف هووداری.

**هەویج:** ڕتل، تۆرەكەی گونپێستێكە هێلكەگونی تێدایە ف كيسهٔ بيضه، خایەدان.

**هەوێدار:** هەوێبار ف هوودار.

**هەوێداره:** گیایەكی زۆر گەلاّپانە ف گیاهی است بسیار برگ پهن.

**هەوێدی:** جۆرێ گەنمەزەردە ف نوعی گندم.

**هەویر:** هەڤیر ف خمیر.

**هەوێر:** هاوێر، جیاكـــردنـــەوەی ماكو زا لە یەكتـر ف جداكـردن بره و بزغالەها از گله.

**هەوێرا:** ئازا، نەترس، وێرا، بوێر ف شجاع، نترس.

**هەویرترش:** خەمیرە، ئامیانی هەویر ف خمیرمایه.

**هەوێرده:** ١) بالّنـدەیەكـە كەمێ لە ڕێشۆلّە زلتر كونجی كونجی یەو زۆر عاشقی هەرزنـە زۆر قەلّـەوە؛ ٢) تاژیەك كە دایكی دوورەگو باوكی نێرەتـاژی بێ، قەمـــچ ف ١) وشم، بلدرچین؛ ٢) سگ تازی از مادر دورگه و از پدرتازی.

**هەویرشێل:** هەڤیرشێل ف خمیرسرشت، خمیرگیر.

**هەویرشێلان:** هەڵپشاوتنی هەویر، هەڤیرشێلان ف خمیرچلانیدن.

**هەوێركـان:** هۆزێكی مەزنی كوردە لە مەلّبـەنـدی جزیرەی سۆریاو لە كوردستانی بەردەستی تركان دەژین ف عشیرەای بزرگ دركردستان.

**هەوێركه:** ناوچە، مەلّبەند، هەرێم ف منطقه.

**هەویرواتا:** ئەنگوتكەهەویر ف چونه.

**هەویرەپەته:** نانی كەمبرژاو ف نان نابرشته.

**هەوێری:** ١) وێرایی، بوێری، ئازاتی؛ ٢) نازنـاوی یەزیدیەكـانە ف ١) شجاعت؛ ٢) لقب طايفهٔ ايزدی دركردستان.

**هەوێز:** ١) حەوشەمەڕ، پەچەمەڕ: (مەڕمان نەبو لە پەرێزێ پشكەلّمان دیوە لە هەوێزێ) «مەسەل»؛ ٢) سەربێ‌مۆ، تۆكی سەر وریو ف ١) خوابگاه شبانهٔ گله در دشت؛ ٢) سرطاس.

**هەوێزا:** زڕكوڕ بۆ ژن ف ناپسری، فرزند شوهر از زن دیگر.

**هەوێس:** پەچەمەڕ، هەوێز ف خوابگاه گله دردشت.

**هەوێسار:** هەوێبار ف هوودار.

**هەوێساری:** هەڤینی ف هووداری.

**هەوێك:** چەلێك، جارێك ف يك دفعه.

**هەوین:** تكا، خواهشت ف خواهش.

**هەوێن:** ئامیان، ئامیانی ماستو پەنیر ف مايهٔ ماست و پنير.

**هەوینا:** جاری تریش ف يك بار ديگر هم.

**هەوێنـایش:** ١) پەنـادان، حاوانـدنـەوە؛ ٢) ژێركردنەوەی منالّ ف ١) پناەدادن؛ ٢) نوازش كردن و از گريه خارج كردن كودك.

**هەوین كرن:** تكاو ڕەجاكردن، خواهشت كردن ف خواهش و التماس كردن.

**هەوێن كردن:** ئامیانتێكردن ف مايه در شير ريختن.

**هەوینی:** هەڤینی، هەوێداری ف هووداری.

**هەهـ:** وتەی سەیرمان ف حرف تعجّب.

**هەها:** وتەی سەیرمان ف حرف تعجّب.

**هەی:** ١) لە بۆن بەشداریت؛ ٢) وتەی بانگ كردن بۆ هاوار: (**هەی** دایە، **هەی** بابە)؛ ٣) وتەی پێش سەركۆنەو جوێن: (**هەی** واوالێكراو، **هەی** منالّی هارو هاج)؛ ٤) وتەی سەیرمان: ( **هەی** لەو كچەجوانە)؛ ٥) دنەو

هانــەدان: (هــەی لەو کەسـەی بچێ گورگ بکـوژێ)؛ ۶) وتـەی لێخــوڕینی یەکسم؛ ۷) بەڵێ؛ ۸) جارێك ف ۱) تو هستی؛ ۲) پیش درآمد پناه بردن و کمك خواستن؛ ۳) پیش درآمد سرزنش و دشنام؛ ۴) حرف تعجّب؛ ۵) حرف تشجیع؛ ۶) حرف راندن ستور؛ ۷) بلی؛ ۸) یك بار.

**هەیا:** ۱) هەتا، تا؛ ۲) بەڵێ، لەبێ؛ ۳) شەرم ف ۱) حتّی؛ ۲) بلی؛ ۳) حیاء.

**هەیاتی:** ۱) بوُن؛ ۲) دارایی ف ۱) موجودیّت؛ ۲) دارایی.

**هەیاران:** ۱)ئەی دۆستان؛ ۲) ئاخوا، داخوا: (**هەیاران** ئێستا لەکوێیە) ف ۱) ای دوستان؛ ۲) آیا.

**هەیاس:** ۱) ناوە بۆ پیاوان؛ ۲) کەسـێ پای لە ڕێڕۆیشتنـا پێکــەوە دەنـوُسێ؛ ۳) گونـدێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد ف ۱) نام مردانــه؛ ۲) کسی که پاهــایش در راه رفتن بهم می‌خورنـد؛ ۳) از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**هەیاسچقـل:** لەو گونـدانـەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی درکردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**هەیاسە:** کەمبەرەی زێڕ و زیو ف کمر بند نقره‌یی و زرین.

**هەیانا:** ئەوەندە، ئەوئەندازە ف این اندازه، اینقدر.

**هەیانە:** هەسیان، لایان دەس ئەکەفێ ف دارند.

**هەیام:** عەیام، ڕۆژگار ف زمانه، روزگار.

**هەیبان:** هەیوان، هەویان ف ایوان.

**هەیبوّر:** هەنگۆری، ئەنگۆرە ف عصرهنگام.

**هەیبە:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**هەیبەت:** ۱) مەترسی، خوَف؛ ۲) ناوە بۆ ژنان؛ ۳) ناوە بۆ پیاوان ف ۱) هَیْبت؛ ۲) نام زنانه؛ ۳) نام مردانه.

**هەیبەر:** دۆزو مەبەستێکی شیاوی نوُسین ف سوژه.

**هەیبەسوڵتان:** چیایەکە لە کوردستان ف نام کوهی در کردستان.

**هەیتا:** پەلە، لەز ف شتاب.

**هەیتال:** کوتەڵ ف تمثال، مجسّمه.

**هەی‌تانە:** هەتانە ف دارید.

**هەیتاهەیتا:** لەدوی یەکو بەپەلە ف متوالی و شتاب‌آمیز.

**هەیتم:** هەمە، دێرم ف دارم.

**هەیتوهوت:** ۱) خرت‌و پرت؛ ۲) قسەی بێ‌تام‌و خوێ؛ ۳) شات‌و شوت ف ۱) خرت‌و پرت؛ ۲) سخنان بی‌سر وته؛ ۳) لاف وگزاف.

**هەیتوهیت:** قسەی بێ‌ماناو تێکەڵ‌پێکەڵ ف سخنان بی‌سر وته.

**هەیتە:** ۱) نوکەری بەردەستی خان‌و ئاغا؛ ۲) هەتە، شكدەبەی، دێری؛ ۳) لەقەمی هێندێك لە چەكدارانی عوسمانی بو ف ۱) پاکار ارباب؛ ۲) داری؛ ۳) لقب بعضی از سر بازان دولت عثمانی.

**هەیتـەهـوّل:** گەمـەو سەرگەرمی‌یەکی کوردانە وەك گۆیێن دەچێ ف نوعی بازی.

**هەیتەهەیت:** هەراو هوریا ف جاروجنجال.

**هەی‌جو:** خوازبێنی کەر ف خواستگار.

**هەی‌جۆ:** وتـەیەکـە لە گەمەی خازەلێ‌دا دەیڵێن ف اصطلاحی در قایم موشك بازی.

**هەی‌جۆهەی‌جۆیێن:** گەمەی خازەلێ ف قایم موشك بازی.

**هەی‌جوُی:** خوازبێنی، خازگینی ف خواستگاری.

**هەیدەران:** هۆزێکی زۆر قەوغای کوردە لە نێوان وان‌و سقەرەك‌و دەرسیم دەژین ف عشیره‌ای بزرگ در کردستان.

**هەیدەری:** جۆرێ گوارەی گوێ ف نوعی گوشواره.

**هەیدێ:** برۆ لاچۆ ف بر وگمشو.

**هەیرۆ:** ۱) وتـەی شیوەن‌گێڕان؛ ۲) وتـەی سەیرمانی ژنانە ف ۱) کلمهٔ نوحه‌گری؛ ۲) حرف تعجّب خانمها.

**هەیشت:** هەشت، یەك لە حەوت زیاتر ف هشت.

**هەیشتای:** هەشتێ، هەشتا ف هشتاد.

**هەیشتاین:** هەشتایەم ف هشتادمین.

**هەیشتن:** هەشتەم ف هشتم.

**هەیشتێس:** هەژدە ف هیجده.

**هەیشتێسن:** هەژدەهەم ف هیجدهم.

**هەیشوّ:** ژنی سەڵیتەو زمان‌درێژ ف زن سلیطه.

**هەیشـەت:** ۱) ئاوەدانی قەوغـا؛ ۲) حەشـامـاتی خەڵك ف ۱) آبادی پرجمعیّت؛ ۲) انبوهی مردم.

**هەیف:** ۱) مانگی عاسمان؛ ۲) حەیف، مخابن؛ ۳) توڵە، قەرەبو؛ ۴) رق، رك ف ۱) ماه آسمان؛ ۲) دریغ؛ ۳) انتقام؛ ۴) کینه.

**هەیف‌ستاندن:** توڵەئەستاندنەوە ف انتقام گرفتن.

**هەی‌فستش:** جەزم‌بوُن، حاڵ‌لێ‌هاتن ف به حالت جذبه دچار شدن.

**هەیف‌هەڵێنان:** هەیـف‌ستاندن: (ئـەزێ‌هـەیفاخوّهـەلێنم) ف انتقام گرفتن.

**هەیف:** ۱) مانگی عاسمان؛ ۲) مانگی ساڵ ف ۱) ماه آسمان؛ ۲) ماه سال.

**هەیڤاپڕ:** مانگی چاردە ف بدر.

**هەیڤانە:** مانگانە، جیرەی مانگانە ف جیرهٔ ماهیانه.

**هەیڤك:** مانگیلە، مانگی یەکشەوە ف هلال.

**هەیڤی:** مانگی: (سـالا هەیڤی دەرۆ کێمتـرن ژ ساڵێن دن) ف قمری، سال قمری.

**هەیڤێ:** ناوی ژنانە ف نام زنانه.

**هەیڤێ‌سوُر:** دروشمی دام‌و دەزگای دەوڵەتانە لە بابەت داودەرمانەوە ف هلال احمر.

**هەیکە:** دەنگی‌دە با بڕوا ف نهیب‌زن تا برود، هی کن!.

**هەیکـەل:** ۱) قەڵافـەت، بەژن‌و باڵا: (پیاوێکی بە **هەیکـەل** بو)؛ ۲) قوّڵ‌بەنـدی زیو ی نەخشـاو؛ ۳) پەیکـەر، کوتەڵ لە کانزاو دار ف ۱) ریخت و قیافه، هیکل؛ ۲) بازوبند نقره‌یی منقوش؛ ۳) مجسّمه، تندیس.

**هەیکەل‌تراش:** پەیکەرچێکەر، کوتەڵ‌ساز بە کانزاو دار ف مجسّمه‌ساز

پیکرتراش.

**هەی کەوتش:** جەزمەی گرت، حاڵی لێ هات ف دچار جذبه شد.

**هەی گۆڕ:** شیاوی ئەم سزایە خۆیەتی: (دەبـا واتلێ بێ مافی خۆتـه هەی گۆڕ) ف سزاوار این است.

**هەیلۆ:** ۱) بانگ لە کوڕ کردن، هەی لاوی هەژاروٚکە؛ ۲) ئەی بێچارە، بۆ گش کەس ئێژن ف ۱) خطاب به پسر جوان، ای جوان بیچاره؛ ۲) ای بیچاره، خطاب به هرکس.

**هەیلێ:** بانگ لە ژن و کچ کردن یانێ هەی کیژی بەستەزوان و لێ قەوماو ف خطاب به زن و دختر یعنی ای دختر بیچاره.

**هەین:** لەبوٗندایِن ف هستیم.

**هەینا:** جارێ تریش، دیسان ف باز، دوباره.

**هەینو:** ئین، جوعمە، جومعە، هەنی ف جمعه، آدینه.

**هەینە:** ۱) هەنگی، ئەوساکە؛ ۲) هەینو؛ ۳) هەین؛ ۴) وس، بێدەنگ بە ف ۱) آنگاه؛ ۲) آدینه؛ ۳) هستیم؛ ۴) خاموش باش.

**هەینی:** ۱) هەینو؛ ۲) هەنی، شوٗتی، جەبەژ، شمتی ف ۱) آدینه؛ ۲) هندوانه.

**هەینێ:** ۱) هەنگینێ، ئەوساکە؛ ۲) هەینو؛ ۳) هەی، هەرێ ف ۱) آنگاه؛ ۲) آدینه؛ ۳) آهای.

**هەیو:** هەیڤ ف نگا: هەیڤ.

**هەیواخ:** ۱) ئەی داد، ئەی داخ، وشـەی خەمبـاری؛ ۲) سەرەتـای هێندێك لە سترانانە ف ۱) کلمهٔ ابراز غم و اندوه؛ ۲) سرآغاز بعضی از ترانه‌ها.

**هەیواخ لمن:** هەیواخ ف نگا: هەیواخ.

**هەیوان:** هەویان ف ایوان.

**هەیوانان:** ناوەڕاستەکا بەهار ف اواسط بهار.

**هەیوانە:** مانگانە ف ماهانه.

**هەیوو:** هەویان، هەیوان ف ایوان.

**هەیوە:** ۱) میوەی بێ، بەهێ؛ ۲) هەتانە ف ۱) میوهٔ به؛ ۲) دارید.

**هەیوەجان:** بسکی سەر لاجانگ ف گیسو.

**هەیوی:** مانگی ساڵ ف ماه سال.

**هەیوێ:** ناوی ژنانە ف نام زنانه.

**هەیە:** ۱) ماوە، زینـدوە؛ ۲) دەست پێ ڕادەگا: (کـابـرا خۆی هەیە دە لێی پرسە)؛ ۳) وێدەچێ، رەنگە؛ ۴) هەس: (چی لەئاودا هەیە؟) ف ۱) زنده است؛ ۲) در دسترس است؛ ۳) چنین پیداست؛ ۴) هست.

**هەیها:** ۱) وتەی باوەڕنەکردن: (**هەیها** ئەوە چوٚن درۆیەك بو)؛ ۲) وتەی ئەسپ و ماین ئاژۆتن ف ۱) علامت باورنکردن؛ ۲) کلمهٔ راندن اسب.

**هەیهات:** هەرگیز پێك نایە، دوٗرە ف ممکن نیست، هیهات.

**هەیهای:** وتەی سەیرمان بەخەمەوە ف کلمهٔ تعجب اسف‌آمیز.

**هەیەتی:** ۱) ژیان؛ ۲) دەوڵەمەندە؛ ۳) لای دەست دەکەوێ ف ۱) حیات؛ ۲) ثروتمند است؛ ۳) دارد.

**هەیەکو:** رەنگە، وێدەچێ کە ف احتمال دارد که.

**هەیهۆ:** وتەی باوەڕنەکردن ف کلمهٔ ناباوری.

**هەیهوٗ:** ۱) وتەی سەیرمان؛ ۲) هەیهات ف ۱) حرف تعجّب؛ ۲) هیهات.

**هەیهۆت:** مانگی سەرماوەز، ئاخری پایز: (هات **هەیهۆت** خلاس بوٗن مەهێ بجوٚت) ف آذرماه.

**هەیهوٚلان:** ۱) وتەی سەیرمان؛ ۲) سەیر و سەمەرە؛ ۳) واق‌ورمێن ف ۱) حرف تعجّب؛ ۲) شگفت‌آور؛ ۳) شگفت‌زده.

**هەی‌هەی:** ۱) وتـەی سەیرمـان؛ ۲) وتـەی گەمـەپێکـردن؛ ۳) وتـەی ئافـەرین و شادی: (**هـەی‌هەی** چمەجلیسێ بوٗ دوێنێ لە دیدەو دڵ/ دڵبـەر شەرابی گێڕا سالم کەبـابی هێنا) «سالم»؛ ۴) دەنگدانی گەلە لەلایەن شوانـەوە ف ۱) حرف تعجّب؛ ۲) حرف تمسخـر؛ ۳) کلمهٔ تحسین و آفرین؛ ۴) کلمهٔ راندن گله.

**هەیهێر:** گەرم‌داهاتنی توٗڕەیی: (دلکێ من بە**هەیهێرە**) ف تشدید خشم.

**هەیهێز:** غیرەت و نەترسی، بوێری ف جرأت، شجاعت.

**هەیی:** ۱) بوٗن، هەبوٗن؛ ۲) دەوڵەت و دارایی ف ۱) بودن؛ ۲) دارایی.

**هەیین:** بوٗن، مان، زیندوەتی ف زنده بودن.

**هی:** ۱) ئی، وتـەی تایبـەتی شتێ بە کەسێ: (**هی** تۆیە، **هی** منـە)؛ ۲) کەمترین دەنگی پێکەنین؛ ۳) کەمترین دەنگی گریان؛ ۴) شێ، شە، شی، نم، تەڕایی ف ۱) پیشـونـد تملیك و اختصـاص و نسبت؛ ۲) کمترین صدای خنده؛ ۳) کمترین صدای گریه؛ ۴) نم، رطوبت.

**هێ:** ۱) پیتی بانـگ‌کردن؛ ۲) هەر، مانای نەبڕانەوە دەدات: (هێ هات هێ چو)؛ ۳) ناوی پیتێ لە ئەلف‌وبێتکە؛ ۴) ئیشارە بوٚ نزیك: (وێ هێ واتا: ئەوەتا، هێ‌وەوەرە واتا: بوٚ ئێرە وەرە)؛ ۵) خا، هێلکە؛ ۶) فێر؛ ۷) هێشتا؛ ۸) دیسان؛ ۹) بەڵێ چت‌فەرمو ف ۱) حرف ندا؛ ۲) هر؛ ۳) حرف «هـ»؛ ۴) اشاره به نزدیك؛ ۵) تخم پرنده؛ ۶) آموخته؛ ۷) هنوز؛ ۸) دوباره؛ ۹) بلی.

**هێ‌بوٗن:** فێربوٗن، راهاتن ف یادگرفتن.

**هێبـەر:** کەسێ کە هەر لە شوێن‌خوی دەمێنێ و سەفـەر ناکا ف حضر، مقابل سفر.

**هیپە:** هرتە ف نگا: هرتە.

**هیت:** ۱) رەنگێکـە بوٚ بزن: (بـزنـا هیت وەرێن)؛ ۲) جوٚت، جوٗت، زەوی کێڵان؛ ۳) تین، گەرمـای تاوێ: (هیتی کەتـە زەڤیان)؛ ۴) تەڕ، شێدار ف ۱) رنگی برای بز؛ ۲) شخم‌زدن؛ ۳) گرمـای آفتـاب؛ ۴) نمدار، مرطوب.

**هێت:** ۱) خوٚت؛ ۲) سمت و کەفەڵ؛ ۳) ران بەگشتی، لە ئەژنوٚ بەرەژوٗر تا بن زگ؛ ۴) ورد. دەگەڵ پێت دەگوترێ؛ ۵) بەلەك؛ ۶) وڵمەگوٚشتی زل؛ ۷) خاڵیگە ف ۱) خودت؛ ۲) باسن؛ ۳) ران، از زانو تا زیرشکم؛ ۴) خرد، ریز؛ ۵) ساق؛ ۶) قطعه گوشت بزرگ؛ ۷) تهیگاه، پهلو.

**هیتتك:** ۱) مەرەز؛ ۲) بزنەمەرەز ف ۱) پشم نرم نوعی بز؛ ۲) بز نرم موی.

**هێت‌خوار:** گێڕ، قوٗن‌خوار، سمت‌خوار ف باسن کج.

**هیتر:** ئەوی دیکە ف دیگر، دیگری.

**هێتم:** ۱) تمتمە، نوٗکی مەزرەق؛ ۲) لاقوٗنم، رانم؛ ۳) سێوی، هەتیو ف ۱) نوك گردنا؛ ۲) باسنم؛ ۳) یتیم.

**هێت‌وپێت:** وردوخاش ف خردوخاك.

**هیتـوت:** گوندێکه له کوردستان بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**هێتوُن:** ئێتوُن، توُن، ئاگردانی گەرماو ف تون حمّام.

**هێتوُین:** توتن، تەماکۆ ف توتون.

**هیته:** ۱) هاوتا، هامتا، جوُت؛ ۲) تەڕ، شەدار ف ۱) همتا، جفت هم؛ ۲) نمدار، تر.

**هیتەوان:** جوتیار، جوُتبەندە ف برزگر.

**هیتی:** گەرمایی، تین ف حرارت، تابش.

**هیتیار:** هیتەوان، جوتیار ف برزگر.

**هیج:** رقهەستاو ف خشمگین.

**هێجبی:** خوازبێنی، خوازگینی ف خواستگاری.

**هێجبیکار:** خوازبێنیکەر ف خواستگار.

**هیجران:** سەبەب، هوٚ ف انگیزه.

**هیجرانی:** قامێکه، هەوایەکی گۆرانی‌یە ف آهنگی است.

**هیجرەت:** دوُرکەوتن له زێد ف هجرت.

**هێجن:** حوشترێ که بوٚ سواری تالیم دەدرێ‌و باری‌ناکەن ف شتر سواری.

**هیجوی:** هێجبی ف خواستگاری.

**هیجوی کەر:** هێجبیکار ف خواستگار.

**هێجەت:** بەلَپ، بیانو، بەهانە ف بهانه.

**هیچ:** ۱) نەتْشت؛ ۲) قەت: (**هیچ** نەمدیوی، **هیچ** نەهـاتوە بەلاما)؛ ۳) شت: (**هیچت** لایە، **هیچم** لانیە)؛ ۴) بێ‌فایدە: (ئـەم‌قسـانـە هەمـو **هیچن**) ف ۱) هیچ؛ ۲) هرگز؛ ۳) شیئ، چیز؛ ۴) بیهوده.

**هێچ:**۱) هیچ،هو یچ؛ ۲) بنەمای ئەزموُن؛ ۳) لرفەی وشتری گەرمداهاتو؛ ۴) حەیوانێ که له ترسی نەقیزە بەدەور خوٚیا خول دەخوا؛ ۵) برێتی له کەسێ که توُڕە کراوەو شێتانە هەڵدەسوُڕێ ف ۱) هیچ؛ ۲) آزمون؛ ۳) صدای لب و دهان شتر خشمگین و تحریك شده؛ ۴) حیوانی که از ترس سیخونك به دور خود بچرخد؛ ۵) کنایه از کسی که خشمگین شده ودیوانەوار بچرخد.

**هێچاندن:** ئـەزموون، تاقی‌کـردنەوە: (**دهێچینـە**) ف امتحـان، آزمایش کردن.

**هیچْت:** شتْ ف چیزیت.

**هیچتا:** تائێستەش ف هنوز.

**هیچتاکێ:** هیچتا ف هنوز.

**هیچتان:** نە هەریەك له ئێوە: (**هیچتان** ناچن) ف هیچکدام از شما.

**هیچتایکێ:** هیچتا ف هنوز.

**هیچ جار:** له جاراندا نەجارێك ف هیچ بار.

**هیچك:** قولَفەداری سەر گوریسی بار، هەچك ف وهنگ.

**هێچك:** هیچك ف وهنگ.

**هیچکار:** بەکارنەهاتگ ف به دردنخور.

**هیچکـارە:** ۱) هیچکـار؛ ۲) دەست‌نەڕۆیشتـو: (قـوێخـاکەمان ئێستا **هیچکارە**یە) ف ۱) بەدردنخور؛ ۲) هیچکاره.

**هیچکام:** نەیەك لەمانە ف هیچکدام.

**هیچ کلوٚج:** هەر هوٚ و سەبەب ف هر وسیله.

**هیچ کەس:** نەکەسێك ف هیچکس.

**هیچـن:** ۱) نرخـیان‌نیە، بەکـارنـایەن؛ ۲) کەس له ئێمــە: (**هیچن** نەن‌بیستوە) ف ۱) بی‌ارزشند؛ ۲) هیچیك از ما.

**هیچنا:** نەتْشت، نەشْت ف هیچ نه.

**هیچ نە:** هەرگیز ف هرگز.

**هیچ نەبێ:** بەلانی کەم ف لااقلّ.

**هیچنی:** ۱) بەکارنایەیت؛ ۲) ئەم‌جوٚرە ف ۱) به درد نمی‌خوری؛ ۲) این طور.

**هیچ‌وپوُچ:** بێ‌نرخ، بێکارە ف بی‌ارزش، بەدرد نخور.

**هیچ‌وپوُیچ:** هیچ و پوُچ ف بی‌ارزش.

**هیچ‌وپیچ:** هیچ‌و پوٚچ ف بی‌ارزش.

**هیچە:** بێ‌نرخە، نەتشتە ف هیچ است.

**هیچهار:** هچهار، بیباری سوُر ف فلفل قرمز.

**هێچ‌هێچ:** لرفـەلرفی وشتری گەرمداهاتو: (**هێچ‌هێچا** کوردانە شەرەفا کوردان وەرگرنە وەك لوٚکا موسلیانە شەرەفا کوردا ئەم ناکن ئەردانە) «بەیتی کوردی» ف صدای لب و دهان شتر تحریك شده و خشمگین.

**هێچی:** ۱) توُڕە؛ ۲) هار، ئەوی نەخوٚشی هاری گرتبێ ف ۱) خشمگین؛ ۲) دچار بیماری هاری.

**هیچ‌یەك:** هیچ‌کەسێك لەوا کەسانە ف هیچیك.

**هێدان:** ۱) ئوٚقرە، داسەکنان، هەدادان؛ ۲) سەیر، سەمەرە: (نیشانەکا **هێدانێ**)؛ ۳) دروشـمـی پـرسـیار بوٚ سەیرمـان «؟»؛ ۴) دروشـمـی ناسینەوە؛ ۵) گومان ف ۱) آرام، قرار؛ ۲) عجیب؛ ۳) علامت سؤال «؟»؛ ۴) علامت شناسایی؛ ۵) شكّ، گمان.

**هیدایەت:** ۱) ڕێ‌شارەزابوُن: (خوا **هیدایەتی** بدا)؛ ۲) ناوە بوٚ پیاوان؛ ۳) لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف ۱) هدایت؛ ۲) نام مردانه؛ ۳) روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**هێدکی:** ۱) به لەسەرخوٚیی؛ ۲) پشوُلەسەرخوٚیی ف ۱) به آهستگی؛ ۲) صبر و حوصله.

**هێدن:** ئێدن، ئەوی‌تر ف آن دیگری.

**هێدەرە:** گامێشی چوارساڵە ف گاومیش چهارساله.

**هێدی:** ۱) لەسەرخوٚ، سەبر؛ ۲) پشوُ لەسەرخوٚ: (پیاوێکی **هێدی**یە) ف ۱) آهسته؛ ۲) بردبار، آرام.

**هێدی بوُنەوە:** ئوٚقرەگرتن، ئارام‌بوُن ف آرام شدن.

**هێدیکا:** بەسەبر، لەسەرخوٚ: (**هێدیکا** باژوٚ) ف به آهستگی.

**هێدی کردنەوە:** ئارام‌کردن، ئوٚقرەپێ‌گرتن ف آرام کردن.

**هێدی کرن:** داسەکناندن، هەداپێدان ف آرام کردن.

**هێدینا:** ۱) لەوە؛ ۲) ئاوها ف ۱) از این؛ ۲) چنین.

**هێدیەوبوُن:** هێدی بوُنەوە ف آرام شدن.

**هێدیەوکردن:** هێدی کردنەوە ف آرام کردن.

**هێدی‌هێدی:** ۱) کەم‌کەمـە؛ ۲) سەبـرەسـەبرە ف ۱) اندك اندك؛ ۲)

یواش یواش.

**هیر:** ۱) گێژ، وڕ؛ ۲) ورد، هوُیر؛ ۳) سێ، سسێ ف ۱) گیج؛ ۲) ریز، خرد؛ ۳) سه. عددی بین دو و چهار.

**هێر:** ڤر، ئێره، ئەگره ف اینجا.

**هێڕ:** ۱) گێڕ، سمت‌خوار؛ ۲) گێژو وڕ؛ ۳) دەنگی بزن؛ ۴) کەسێ کە شتی وەك ئارد دەهاڕێ ف ۱) باسن کج؛ ۲) گیج و منگ؛ ۳) صدای بز؛ ۴) کوبنده، خردکننده، پودرکننده.

**هیرا:** فرەوان، پان‌و بەرین، هەراو ف فراخ، وسیع.

**هیرام:** ۱) چارشێوی ژنـان؛ ۲) هیزار، جۆرێ جبەی ژنانه ف ۱) چادر زنانه؛ ۲) نوعی شانه‌پوش زنانه.

**هیران:** گوندێکه لە کوردستان کە بەعسی کاولیان کرد ف نام دهکده‌ای در کردستان است که بعثیان ویران کردند.

**هێڕان:** هاڕین، وردکـردنی دەخـڵ بە دەستـاڕ یان ئاش ف پودر کردن، کوبیدن و آرد کردن غلّه با دستاس یا آسیاب.

**هێڕانـدن:** ۱) هاڕین؛ ۲) دەنـگ بڵنـدکردنی بزن؛ ۳) حیلەی ئەسپ، حیلاندن ف ۱) آردکردن؛ ۲) نعره‌زدن بز؛ ۳) شیهه‌کشیدن اسب.

**هیراهیره:** ۱) خیلکـەحیلك؛ ۲) حیلەحیلی ئەسپ ف ۱) قهقههٔ خنده؛ ۲) شیههٔ اسب.

**هیرایش:** حیلەی ئەسپ ف شیههٔ اسب.

**هیرایی:** گوشادی، پانایی، هەراوی ف فراخی، گشادی.

**هیربار:** ۱) ئیربار، هەوڕ، دەفری گڵینی سوُرەوەکراو؛ ۲) قاپ‌و قاچاخی ماڵ ف ۱) ظروف سفالی؛ ۲) ظروف خانگی.

**هیربهیر:** سیان سیان ف سه‌تاسه‌تا.

**هێڕتن:** هاڕین، وردکردنی دەخڵ ف آردکردن غلّه.

**هیرته:** هرته، هیپه ف نگا: هرته.

**هیرجەم:** سێ‌ژەمە ف سه‌وعده.

**هیرد:** ورد، هوُیر ف خرد، ریز.

**هیرده:** وردە، ورتکە ف خرده، ریزه.

**هێرز:** ركهەستاو ف خشمگین.

**هیرس:** سی، بیست و ده ف سی، بیست بعلاوهٔ ده.

**هێرس:** ۱) توُڕە، ركهەستاو؛ ۲) ركهەستان ف ۱) خشمگین؛ ۲) خشم.

**هێرس‌بوُن:** دەڕکەوەچوُن ف درخشم شدن، خشمگین شدن.

**هێرس‌دان:** دەربڕینی توُڕەیی ف ابراز خشم.

**هێرس کرن:** دنەدان بۆ توُڕەکردن ف تحریك کردن برای به خشم آمدن.

**هیرسْن:** سێهەمین ف سومین.

**هێرسۆك:** مرۆی هەمیشە توُڕە ف همیشه خشمگین.

**هێرسۆکْن:** هێرسۆك ف همیشه‌خشمگین.

**هێرسۆکنە:** هێرسۆك ف همیشه خشمگین.

**هیرسەی:** سێ‌چەل سەت ف سیصد.

**هێرش:** ۱) زۆربۆهێنان؛ ۲) پەلامار؛ ۳) ئەسر، ئەسرین، ڕۆندك، فرمێسك ف ۱) فشار؛ ۲) هجوم؛ ۳) اشك.

**هێرش‌بردن:** پەلاماردان، شاڵاوبردن ف حمله‌کردن.

**هێرش کردن:** هێرش بردن ف حمله‌کردن.

**هێرش‌هێنـان:** ۱) هجوم‌هێنان؛ ۲) زۆربۆهێنان ف ۱) حمله‌آوردن؛ ۲) فشار آوردن.

**هێرفـانـدن:** ۱) وەرگێڕان، پشت‌ورووکـردن؛ ۲) ڕمـانـدن، ڕوُخاندن؛ ۳) وردکردن وەك توز ف ۱) برگرداندن؛ ۲) خراب کردن بنا و دیوار؛ ۳) خردکردن، پودرکردن.

**هێرفین:** ڕوُخان ف ریزش دیوار و کوه.

**هیرڤیسـتـی:** شەش‌چەل دە، سێ‌چەل بیست، شەیشتی، سێست ف شصت، پنجاه بعلاوهٔ ده.

**هیرڤیستی‌ودەس:** حەفتا، حەفتێ، سێ‌چەل بیست‌و دە ف هفتاد.

**هیرقات:** ۱) سێ‌توێ، سێ‌چین؛ ۲) سێ‌ئەوەندە ف ۱) سه‌لایه؛ ۲) سه‌برابر.

**هیرقوت:** وردکوتراو ف ریز کوبیده.

**هیرقەهیرقە:** دەنگی گریان، فڵقوهوڕی گریان، هەنیسك‌دان ف هِق‌هِق گریه.

**هێرْك:** ۱) گاشـەبەرد، کەڤری مەزن؛ ۲) ئەسپابی ناو ماڵ؛ ۳) هەرزاڵ، پێڕك؛ ۴) دەشتایی پچوُکی ناو چیا ف ۱) صخره، خرسنگ؛ ۲) اثاثیهٔ منزل؛ ۳) جای رختخواب در منزل؛ ۴) دشت کوچك محصور در میان کوهها.

**هێڕك:** ۱) ورگ؛ ۲) جیکڵدانەی مەل ف ۱) شکمبه؛ ۲) چینه‌دان پرنده.

**هێرکول:** باوەشێن ف بادبزن.

**هێرکە:** دەخڵی نیوەکوتراو ف غلّهٔ نیمکوب.

**هیرگام:** سێ باز هاویشتن ف پرش سه‌گام.

**هیرگام‌پەرایش:** پەڕینی سێ‌باز ف پرش سه‌گام.

**هیرگوُش:** شەنەی سێ‌حاچە ف افشون سه دندانه.

**هێرگیز:** هەرگیز، بەهیچ کلۆجێ ف هرگز.

**هیرلا:** سێ‌قات، سێ‌توێ ف سه‌لایه.

**هیرلەت:** سیانە بە زگێك، شنگڵەبەرەکەتەی سیانە ف سه‌قلو.

**هیرْن:** سێهەم ف سوم.

**هیرنا:** سیانی تریش ف سه‌تای دیگر.

**هێرناییـنە:** کڕین، سەنن ف خریدن.

**هێرنگ:** هێڵەگ، مۆخڵ ف الك.

**هیرنە:** ۱) سێهەم؛ ۲) سێهەمینەکە ف ۱) سوم؛ ۲) آن سومی.

**هیرو:** ۱) هەڵوُژەڕەشە، ئاڵوبخارا؛ ۲) هەرمەڵە، هێروٚ ف ۱) آلو بخارا؛ ۲) گل ختمی.

**هیروٚ:** هێروٚ، گیایەکە بۆ دەرمان دەشێ، هەڵمەڵە ف گل ختمی.

**هێروٚ:** ۱) هەرمـەڵـە، هیرو؛ ۲) لەو گونـدانـەی کوردستـانە کە بەعسی کاولیان کرد ف ۱) گل ختمی؛ ۲) روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**هێڕوٚ:** ئەی گێژ، ئەی وڕ، کاورای گێژ ف ای گیج، ای سراسیمه.

**هێروشك:** هەرمێشك ف چنگال، ترید نان در روغن.

**هیروٚگ:** زەردەلی، قەیسی، مژمژ، شەلانی، شێلانی، شێلانە ف زردالو.

**هێروگه:** هەڵوژە، هەڵوچە، عەلوکە ف آلوچە.

**هێ‌ڕۆن:** نیمرو، خاورۆن ف نیمرو.

**هێروە:** ۱) بۆ ئێرە؛ ۲) بە ئێرەدا ف ۱) بە اینجا؛ ۲) از اینجا.

**هیرە:** ۱) وردە، ورتکە؛ ۲) لیر، زیپکەی درێژوکەو پۆرگ لە پێست؛ ۳) سێ ف ۱) خورده، ریزه؛ ۲) کهیر؛ ۳) عدد سه.

**هێرە:** ۱) ئێرە، ئەگرە، هێر؛ ۲) قەرنیز، ریزەخشتێ کە زۆپتر لەسەر هیمو گوێ‌بانـان دادەنـرێ؛ ۳) توژینەوە، لێ‌کۆڵینەوە؛ ۴) ژووری پیاوان بۆ میوانان، دژی هندرو، وەتاغی دەرێ ف ۱) اینجا؛ ۲) هره، ردیف آجر برجستهٔ لب بام؛ ۳) پژوهش؛ ۴) اتاق مهمانخانهٔ مردانه. بیرونی.

**هێڕە:** ۱) دەنگی بەقەوی بزن؛ ۲) خێسە، بە سیلەی چاو تماشاکردن؛ ۳) وتەی توڕەبونی شوان لە پەز ف ۱) صدای بلند بز؛ ۲) نگاه با گوشهٔ چشم؛ ۳) کلمهٔ همراه با نهیب چوپان بر گله.

**هیرەبهیرە:** سێ‌سێ ف سەتا سەتا.

**هیرەچن:** هورك‌درون ف ریزدوختن.

**هیرەس:** دوجار پازده، سی، سێ‌جار دە ف عدد سی.

**هیرەسن:** سیهەمین، دانەیێ دوای بیست‌ونۆیەم ف سی‌ام.

**هیرەسەی:** سێسەت، سێ‌چەلان سەت ف سیصد.

**هیرەڤەتەنە:** لیر لەلەش‌هاتگ ف کهیر بر تن زده.

**هێرەق:** هەستان‌و ڕەپ‌بونی کیر، ئێرەق ف راست شدن آلت تناسلی.

**هێرەقە:** باسکی ئامور ف بازوی بلندخیش.

**هێرەکەر:** توژێن، پشکن، لێ‌کۆڵەرەوە ف پژوهشگر.

**هێرەوە:** ۱) بۆ ئەم‌لایە، هێروە؛ ۲) لەم‌لایەوە ف ۱) به این سو؛ ۲) از این سو.

**هیرهیر:** حیلکەحیلك، تریقەتریقی خەنین ف قهقههٔ خنده.

**هێڕهێڕ:** دەنگەدەنگی بزن ف صدای متوالی بز.

**هیرەهیر:** حیلەحیلی ئەسپ ف شیههٔ پیاپی اسب.

**هێڕەهێڕ:** هێڕهێڕ ف صدای پیاپی بز.

**هێری:** زەوینی زورکانی بەکەندو لەند ف زمین ناهموار.

**هێرێ:** ۱) ئێرە؛ ۲) سیان، دوان‌و یەك ف ۱) اینجا؛ ۲) سەتا.

**هێڕی:** ۱) خوێڕی؛ ۲) گێژی؛ ۳) گێڕی، سمـــت‌خواری ف ۱) آدم بیکاره وبی‌ارزش؛ ۲) گیج هستی؛ ۳) با سنت کج است.

**هێڕێ:** وتەیەکە بەمانا بڕۆ لاچۆ، گوم‌بە ف بروگمشو، هری.

**هیریاڵ:** هیر بار، ئیر بار، هەوڕ، ئامان، قاپ‌و قاچاغ ف ظروف خانگی.

**هیرێس:** سێزده، سیانزە، دەو سێ ف سیزده.

**هیرێسەی:** هیرەسەی، سێ‌چەل سەت ف سیصد.

**هیرێ‌مێنا:** سیهەمین ف سی‌ام.

**هیرین:** سێهەم، هیرن ف سوم.

**هێڕین:** حیلەی ئەسپ ف شیههٔ اسب.

**هێڕین:** ۱) دەنگ‌بڵندکردنی بزن: (ئەو بزنە دەهێڕێنێ بزانە چیەتی)؛ ۲) هاڕین، وردکردنی دەخڵ لە ئاش یان بە دەستاڕ؛ ۳) کون دەدیوارکردن وەك کونەمشك؛ ۴) کونی جێ‌کرم ف ۱) صدابرآودن بز؛ ۲) آرد کردن؛ ۳) سوراخ در دیوار تعبیه‌کردن؛ ۴) سوراخ جای کرم در زمین یا درخت.

**هیرینە:** سێهەم، هیرنە، سێهەمینەکە ف سوم.

**هیریە:** ۱) هەوجـاڕی لەداری بێ‌گاسن کە نوکـەقـەڵانگەکەی کاری گاسنی دەکرد؛ ۲) سێ ف ۱) نوعی خیش قدیمی بدون گاوآهن؛ ۲) عدد سه.

**هیریەس:** سێزده ف سیزده.

**هیرێ‌یەن:** سێهەمین ف سومین.

**هیز:** ۱) ترسـەنـۆك؛ ۲) حیز، گاندەر؛ ۳) خیگ، دەفری ڕۆن‌و پەنیر لە پێستـە، هیزە ف ۱) ترسـو؛ ۲) خودفـروش. کونی؛ ۳) خیك. ظرف روغن و پنیر از پوست حیوان.

**هێز:** ۱) وزە، قەوەت، تاقەت، تابشت؛ ۲) دەستەی هەزارکەسی لە سپا ف ۱) نیرو، توان، قوّت؛ ۲) هنگ ارتش.

**هیزا:** گیایەکی بۆن‌خۆشی کێوی‌یە ف گیاهی است خوشبو از تیرهٔ نعناع.

**هیزاتی:** حیزایەتی، ترسەنۆکی، خوێڕیەتی ف ترسویی، بُزدلی.

**هیزاد:** جبەیەکی ژنانەی ئاوداوێنە کە سەرشانی بە گوڵابەتون دەچندرێ ف نوعی بالاپوش زنانه.

**هێزان:** زۆر بەهێز، بەتاقەت، بەقەوەت ف نیرومند، توانا.

**هیزانکـابنێتی:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**هیزانکێ:** گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**هێزدار:** بەتاقەت، بەقەوەت ف توانا.

**هێزدان:** بەهێزکردن، وزەپێدان ف توان بخشیدن.

**هیزر:** فکر، بیر ف فکر، یاد.

**هیزرە:** سەکۆی لە دارو تەختە بۆ پێستەو کوندە لەسەردانان ف سکوی چوبی جای خیك.

**هێزگرتنەوە:** بوژانەوە ف نیروبازیافتن.

**هێزم:** ئێزنگ، سوتەمەنی ف هیزم.

**هێزنك:** وزەدەر ف تقویت کننده، توانبخش.

**هێزنگ:** ئێزنگ ف هیزم.

**هیزۆپ:** ۱) ناوی کێوێك‌و گەڵیەکـە؛ ۲) لەو گونـدانەی کوردستانە کە بەعـسـی کاولـیان کرد ف ۱) نام کوهی و درّه‌ای؛ ۲) روستـــایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**هێزۆك:** جۆلانەی گوریس ف تاب تاب‌بازی.

**هێزۆکانێ:** لەجۆلانە نیشتن ف درتاب نشستن.

**هیزە:** ۱) خیگەی بەتوکەوە؛ ۲) جۆرێ زگچون؛ ۳) باکردن، ئەستوربون ف ۱) خیك‌مودار؛ ۲) نوعی اسهال؛ ۳) آماس.

**هیزەکە:** پیاوی حیز ف مخنّث.

**هیزەکی:** کاری حیزانە ف اخلاق مخنّثان.

**هیزی:** دوێ، دوێنێ، دوێکە: (هیزی‌شەو، هیزی‌ڕۆ) ف دی.

**هێزیانەوە:** هێزگرتنەوە، بوژانەوە ف نیروبازیافتن.

**هێزیکە:** دوێنێ ف دیروز.

**هیزێنی:** هیزاتی، خوێڕیەتی ف ترسویی، بیکارگی.

**هێژ:** ١) تائێستەش: (**هێژ** نەهاتی‌یە)؛ ٢) خۆی، ئەو بۆخۆی؛ ٣) نرخ، بایی؛ ٤) هێشتا: (بێژم دە بۆست بەرف هاتی‌یە **هێژ** بێترە) ف ١) هنوز، تاکنون؛ ٢) خودش؛ ٣) قیمت؛ ٤) بازهم، هنوزهم.

**هێژا:** ١) تائێستـــەش؛ ٢) زۆر بەنـرخ؛ ٣) هەڵکـەوتـە، بەرکـەتی؛ ٤) نرخ‌هێنـان: (ئەڤ بزنە چەند **هێژایە**؟) ف ١) هنوز؛ ٢) ارجمند؛ ٣) شایستە و لایق؛ ٤) ارزیدن، ارزش داشتن.

**هێژان:** ١) بەرانبـەر بەنـرخ‌بوون؛ ٢) هەژان، ڕاژان؛ ٣) دنـە، هانە؛ ٤) هێشتان ف ١) ارزیدن؛ ٢) جنبیدن بە اطراف؛ ٣) تحریك، تشجیع؛ ٤) هنوز.

**هێژاندن:** ١) هەژاندن، ڕاژاندن؛ ٢) دنەدان، هانەدان؛ ٣) نرخ بۆدانان، قرساندن ف ١) جنبانیدن؛ ٢) برانگیختن؛ ٣) ارزیابی کردن.

**هێژایە:** ١) ئەوەندە دێنێ؛ ٢) زۆر بەنرخە؛ ٣) شیاوی ئەوەی هەیە ف ١) می‌ارزد؛ ٢) ارزشمند است؛ ٣) شایستگی دارد.

**هێژایی:** ١) بەنرخی؛ ٢) شیاوی ف ١) ارزشمندی؛ ٢) شایستگی.

**هێژدە:** دەو هەشت، هەژدە ف هیجدە.

**هێژدەهەم:** هەژدەهەم ف هیجدهم.

**هێژدەهی:** هێژدەهەم ف هیجدهم.

**هێژم:** ١) بۆخۆم؛ ٢) خودی خۆم ف ١) برای خودم؛ ٢) خودم شخصاً.

**هێژمارتن:** هەژمارتن، بژارتن، ژماردن ف شمردن.

**هێژیر:** هەنجیر، هەژیر ف انجیر.

**هێژیرکێ:** لەو گونـــدانـــەی کوردستـانـە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان کە بعثیان آن را ویران کردند.

**هیس:** وتەی بێدەنگ‌کردن، وس، وست ف هیس، بی‌صدا.

**هێس:** ١) هێز، تاقەت، توان؛ ٢) مل‌خوار ف ١) نیرو، توان؛ ٢) گردن کج.

**هیسا:** بەش، پشك، پاژ ف بخش، قسمت.

**هێسا:** ١) ئێستە، هێژ، تا ئێستەش؛ ٢) ئاسوودە، ڕەحەت ف ١) تاکنون، هنوز؛ ٢) آسودە، راحت.

**هێسان:** ١) هاسان، دژی دژوار؛ ٢) تا ئێستەش ف ١) آسان؛ ٢) هنوز.

**هێساندن:** کار هاسان‌کردن، گەیاندنە سانایی ف کار را آسان کردن.

**هێسانی:** هاسانی، ئاسانی، سانایی ف آسانی، سهولت.

**هێسایی:** ١) ئاسوودەیی؛ ٢) ئارامی ف ١) آسایش؛ ٢) آرامی.

**هێستا:** ١) تا ئێستەش؛ ٢) ئێستە، هەر لەجێ ف ١) هنوز؛ ٢) اکنون.

**هێستاکانێ:** هێستا ف نگا: هێستا.

**هێستاکونێ:** هێستا ف نگا: هێستا.

**هێستاکینێ:** هێستا ف نگا: هێستا.

**هێستـر:** ١) ڕۆندك، فرمێسك، ئەسر، ئەسرین، ئەشك؛ ٢) ئێستر، قاتر، قانتر ف ١) اشك؛ ٢) استر.

**هێسترانی:** جووتەهاویشتن ف لگدپرانی.

**هێسترسوار:** قانترسوار ف قاطرسوار.

**هێسترڤان:** قاترچی، ئاگاداری ئێستران، قانترلەوەڕێن ف قاطرچران.

**هێستك:** پێشە، ئێسقان، سخان ف استخوان.

**هێستی:** هێستك ف استخوان.

**هیسر:** کەندوی بەشوڵ‌تەنراو ف کندوی غلّە تنیدە از ترکە.

**هێسر:** ئێستر، قانتر ف استر.

**هێسك:** پێشە، هێستك ف استخوان.

**هیسسەت:** وەج، ئابڕو ف حیثیّت.

**هیسل:** هیسر، کەندوی چەپەر ف نگا: هیسر.

**هێسل:** گوشینگە ف معصرە.

**هێسن:** ١) ئاسن، هەسن؛ ٢) ماك، ڕەگەز ف ١) آهن؛ ٢) مادە، گوهر.

**هێســوون:** سوون، بە هەسـاندا هێنان ف برفسان ساییدن.

**هیسەر:** هەمار، عەنبار ف انبار.

**هیسێ:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان کە بعثیان آن را ویران کردند.

**هێسیر:** ١) ڕۆنـدك، هێستـر، ئەسـر، ئەشـك، ئەسـرین، فرمێسك؛ ٢) یەخسیر، دیل ف ١) اشك؛ ٢) اسیر.

**هیش:** ١) ئازووقەی هەڵگیراو لە ماڵدا: (دانەوێڵەمان کردە **هیشخان**)؛ ٢) خاکی بەڕەنگی تایبەتی، گڵەسوورە، گڵەزەرد ف ١) بنشن و آذوقە؛ ٢) خاك رنگی.

**هێش:** ١) هەوجـاڕ، ئامـوور؛ ٢) وتـەیەکـە بۆ گێڕانەوەو ڕاگرتنی ئاژەڵ: (**هێش** بزنی خاوەن‌مردی)؛ ٣) قەراخ‌ئاو، کەنارئاو، بەستێن، بەستۆڕە: (دبێن قارس **هێشـا** بەحرێ‌یە)؛ ٤) هۆش، ئاوەز؛ ٥) تا ئێستەش: (ژ ددانان حەپەحەپە پیرەمێر **هێش** حەسەپە) ف ١) خیش؛ ٢) کلمەای برای بازایستاندن حیوان؛ ٣) کرانە. کنار آب؛ ٤) هوش؛ ٥) هنوز.

**هیشار:** سەرپۆشی ژنانە ف روسری.

**هیشت:** وشت، هێی ف آهای.

**هێشـت:** ١) ڕای‌گرت، هێشتی، هێشتی‌یەوە؛ ٢) وازی لێ‌هێنـا ف ١) نگهداشت؛ ٢) بەحال خود رها کرد.

**هێشتا:** تائێستەش ف هنوز.

**هێشتاکانێ:** هێشتا ف هنوز.

**هێشتاکو:** هێشتا ف هنوز.

**هێشتاکونێ:** هێشتا ف هنوز.

**هێشتاکینێ:** هێشتا ف هنوز.

**هێشتان:** ١) هێشتا؛ ٢) ئێوە لێ‌گەڕان: (بۆ **هێشتان** بچێ؟) ف ١) هنوز؛ ٢) گذاشتید.

**هێشتانەکێ:** هێشتا ف هنوز.

**هێشتانێ:** هێشتا ف هنوز.

**هێشتر:** وشتری مێوە، مێچکەحوشتر ف اشتر مادینە.

**هێشترسوار:** حوشترسوار ف شترسوار.

**هێشترڤان:** سارەوان، سالوان، وشترەوان ف ساربان.

**هێشتن:** ١) ڕێگەدان، ئیجازەدان. *کە ڕابردوی هەیەو بۆ ئایندە ناگوترێ*: (**هێشتی** بچم)؛ ٢) لەدوای پێشگری «ڕا» بەمانا درێژکردنەوە: (بانگی

ڕاهێشت، گوریسی ڕاهێشت)؛ ۳) لەپاش پێشگری «دا» واتا: بەرەوخوارکردنەوە: (گوریسی بۆ داهێشت پێی سەرکەوێ)؛ ۴) ڕاگرتن‌و دەست‌لێ‌نەدان: (دەستارەکەی جێ‌هێشت، هەر لەوجێگە هێشتی، ئاوا **هێشتن** باش نیە) ف ۱) اجازەدادن؛ ۲) پس از پیشوند «ڕا» به معنی درازکردن؛ ۳) بعد از پیشوند «دا» به معنی روبەپایین دراز کردن؛ ۴) هشتن، باقی گذاشتن.

**هێشتنەوە:** ۱) ڕاگرتن؛ ۲) باقی‌هێشتن ف ۱) نگهداشتن؛ ۲) باقی گذاشتن.

**هێشخان:** وچخانە، خەڵوەتی، ژوری کەل‌وپەل‌و ئەرزاق ف پستو، انبار آذوقه.

**هێشرمە:** هاشرمە ف رانکی.

**هیشك:** ۱) وشك؛ ۲) ڕەق ف ۱) خشك؛ ۲) سفت، سخت.

**هێشك:** کێشك ف نگهبانی.

**هیشکارە:** داری وشك‌و گەندەڵ ف درخت خشك و پوسیده.

**هیشکانی:** بەژ، وشکانی ف خشکی، برّ، مقابل دریا.

**هیشکایی:** ۱) هیشکانی؛ ۲) وشکی ف ۱) نگا: هیشکانی؛ ۲) خشکی، مقابل تری.

**هێشکایی:** ۱) وشکی؛ ۲) ڕەقی ف ۱) خشکی؛ ۲) سفتی، سختی.

**هێشو:** ۱) وشی ترێ؛ ۲) گوڵی دەغڵ ف ۱) خوشهٔ میوه؛ ۲) خوشهٔ غلّه.

**هێشوکردن:** دەسگ‌و گوڵ‌کردن، گوڵ‌چنینەوە ف خوشه‌چینی.

**هێشوگەر:** گوڵچین ف خوشه‌چین.

**هێشە:** ۱) ئامور، ئەسپابی جوت؛ ۲) جارێك کێڵان: (شوەکە دوهێشەبە) ف ۱) خیش؛ ۲) یکبار شخم زدن.

**هیشەت:** هەیشەت ف نگا: هەیشەت.

**هێشەماڵ:** خێشك ف مالهٔ شخم صاف کن .

**هیشی:** ۱) کەنار، قەراخ، قەراغ؛ ۲) گوڵینگەی شوڕەوەبوگ لە چادر، هێشی ف ۱) کنار؛ ۲) منگولهٔ آویزان خیمه.

**هیشێ:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**هێشی:** ۱) گوڵینگەی شوڕی خێوەت‌و چادر؛ ۲) وشی ترێ؛ ۳) کڕێوە، باکوت؛ ۴) گوریسی زۆر ئەستور، کەندری زۆر قایم‌و ئەستور ف ۱) منگولهٔ آویزان خیمه؛ ۲) خوشهٔ میوه؛ ۳) کولاك؛ ۴) ریسمان کلفت.

**هێشیر:** یەخسیر، دیل، هیسیر ف اسیر.

**هێشیرێنی:** دیلیەتی، یەخسیری ف اسارت.

**هیشیك:** ۱) کوڕو کوزی هەڵپەڕکێ؛ ۲) سەردەستەی سەماکەران؛ ۳) شاڵاو، پەلامار ف ۱) حلقهٔ رقص؛ ۲) پیشاهنگ رقّاصان؛ ۳) حمله.

**هێشین:** ۱) کەوە، هەشین؛ ۲) کەسك، سەوز ف ۱) کبود؛ ۲) سبز.

**هێف:** تماشا، ڕوانین: (**هێف** کرێ واتا: بڕوانە) ف نگاه.

**هێف کرن:** ڕوانین، تماشاکردن ف نگاه کردن.

**هێف کرێ:** بڕوانە ف نگاه کن.

**هیفگە:** نێفەك، نێفوك ف خشتك شلوار.

**هێفەل:** کەفەڵ، کەفەل، لاڕان، سمت ف کفل، باسن.

**هیڤ:** هەیڤ، مانگ ف ماه.

**هێڤ:** هێف، تماشا، ڕوانین ف نگاه.

**هیڤاپڕ:** مانگی چاردە ف بدر، ماه شب چهارده.

**هیڤاتژی:** مانگی چاردە ف بدر.

**هیڤاختن:** درونەوە، چنینەوەی شتی دڕیاگ، وەدرون، درۆتن: (دهیخێڤە) ف رفوکردن.

**هیڤار:** ئێوارە ف عصرهنگام.

**هیڤارە:** هیڤار ف عصرهنگام.

**هیڤاری:** لە ئێوارەدا ف درهنگام عصر.

**هیڤاستن:** چنینەوەی بە تەقەل کە دیارناکا ف رفو کردن.

**هیڤاشتن:** هیڤاستن ف رفوکردن.

**هیڤ‌دەرکەتن:** مانگ‌هەڵاتن ف طلوع ماه.

**هیڤ‌چوئاڤا:** مانگ ئاوابو ف ماه غروب کرد.

**هێڤر:** نشیمەن، جێگەی لێ‌ژیان ف جای زندگی، زیستگاه.

**هێڤڕ:** هێڕان، هاڕین ف آردکردن.

**هێڤڕان:** باراش، زمهەڕ ف بار آسیاب، غلّهٔ آسیاب.

**هێڤراندن:** پەنادان‌و بەخودان‌کردن ف پناه دادن.

**هڤرست:** هەڤرست، دارێکە ف درختی است.

**هێڤس:** نەخش ف نقش.

**هێڤساندن:** نەخشاندن ف منقوش کردن.

**هێڤشاندن:** کۆتایی‌کردن، پاش‌کەوتن ف قصور، کوتاهی کردن.

**هێڤشهان:** دەم‌بەسەرچون: (وەرزی مە **هێڤشها**) ف گذشتن موسم.

**هێڤشین:** بەسەرچونی کاتی بێستان‌و تەڕەکاری ف پایان موسم صیفی‌کاری.

**هێڤشینگ:** چێڵی قسر کە گوێلك هەر دەیمژێ‌و شیر دەدا، کۆندۆ ف حیوانی که برای سال دوم بچهٔ خود را شیر دهد.

**هێڤك:** ۱) مانگیلە، هەیڤك، مانگی یەکشەوە؛ ۲) پینەی کونی چەرم‌و پێستە گرتن بە داروکە ف ۱) هلال؛ ۲) سوراخ چرم را با چوب گرفتن.

**هێڤ کرن:** ڕوانین، تماشاکردن ف نگاه کردن.

**هێڤکرێ:** بڕوانە ف نگاه کن.

**هێڤ کەتی:** جۆرێ نەخۆشی چاو ف نوعی بیماری چشم.

**هێڤ کەمێ:** تماشای کەم، بی‌ڕوانمێ ف نگاهش کنم.

**هێڤ کەنێ:** بڕواننێ، تماشای کەن ف نگاهش کنید.

**هیڤ گرتن:** گیرانی مانگ ف خسوف.

**هێڤۆژە:** دنەدەر، هانەدەر ف محرّك.

**هیڤەرون:** مانگەشەو، تاڤ‌هەیڤ ف مهتاب.

**هێڤی:** ۱) هومێد، ئاوات؛ ۲) تکا، ڕەجا، ئەرجو ف ۱) امید، آرزو؛ ۲) شفاعت، خواهش.

**هێڤی‌بڕین:** ناهومێدبون ف ناامیدشدن.

**هێڤی‌بون:** بەئاوات‌بون، بەتەمابون ف امیدواربودن.

**هێڤیدار:** ۱) ئاواتەخواز؛ ۲) بەهومێد ف ۱) آرزومند؛ ۲) امیدوار.

**هێڤی کرن:** ۱) تکاو ڕەجاکردن؛ ۲) ئاوات‌خوازتن ف ۱) تمنّا و خواهش کردن؛ ۲) آرزو داشتن.

**هێڤی‌مان:** به هومێدەوه چاوەنوڕی کردن: (**ئەم لهێڤیاتەمان**) ف امیدوارانه منتظر بودن.

**هێڤێن:** هەوێن، ئامیان ف مایهٔ پنیر و ماست.

**هێق:** ۱) حێق، گەڕانەوەی ئاوی داوەستاو؛ ۲) دەنگی بەرلەڕشانەوه؛ ۳) ڕشانەوه ف ۱) برگشتن آب راکد؛ ۲) تهوّع؛ ۳) قی.

**هیقایەت:** هەقایەت، حیکایەت، چیرۆك ف داستان.

**هێقم:** ۱) قایم‌و پتەو؛ ۲) زەبەلاح ف ۱) محکم و استوار؛ ۲) تنومند.

**هیك:** لەپڕ، نکاو ف یکهو، ناگهانی.

**هێك:** ۱) خا، هێ؛ ۲) ڕەقایی گون ف ۱) تخم پرنده؛ ۲) بیضه.

**هیکا:** لەپڕێکا، گوزو گومەت ف ناخودآگاه.

**هێکـار:** ۱) فێرکـەر، فێرکـار؛ ۲) فێرەکـار، کارنـاس ف ۱) آموزنده، آموزگار؛ ۲) کارشناس، تعلیم دیده.

**هێکانە:** پیتاك‌و باجی ئاغا له هێلکان ف بهرهٔ مالکانه از تخم‌مرغ.

**هێکانی:** گەمەی هێلکەشکێنه ف بازی تخم‌مرغ شکنی.

**هیکایە:** سەرگوروشته، نەزیله ف حکایت.

**هێکدان:** قونەجوڕەی باڵداری هێلکەکەر ف تخمدان پرندهٔ تخمگذار.

**هێك‌شکاندن:** هێلکەشکێنه ف بازی تخم‌مرغ شکنی.

**هێ کرن:** ۱) فێرکـردن، هوین کرن؛ ۲) هێلکه‌کردن، هێگ‌کرن ف ۱) یاددادن؛ ۲) تخم گذاشتن.

**هێکرۆن:** نیمرو، خاوڕۆن ف نیمرو.

**هێك کرن:** خادانیان، هێلکه‌کردن ف تخم گذاشتن.

**هێك‌ماسی:** گەرای ناو زگی ماسی ف تخمك درون شکم ماهی.

**هێك‌وڕۆن:** نیمرو ف نیمرو.

**هێ کەر:** هێکار، فێرکەر، مامۆستا، سەیدا ف آموزگار.

**هێکەڕۆن:** هێ‌ڕۆن، هێلکەوڕۆن ف نیمرو.

**هێکەل:** لەتەرزی هێلکه ف بیضوی.

**هێکی:** جوڵایی ف بافندگی.

**هێکێ گون:** هێلکه‌گون ف بیضهٔ نرینه.

**هێگ:** هێك، خا، هێلکه ف تخم پرنده.

**هیگا:** موچە، کێڵگه ف مزرعه، کشتزار.

**هێگا:** موچە، مەزرا، کێڵگه، هیگا ف مزرعه.

**هێگن:** پێ‌وێران، دەرۆست‌هاتن ف حریف کسی شدن، از عهده برآمدن.

**هێگنی:** ۱) هێژایی، شیاوی؛ ۲) لێهاتوویی ف ۱) لیاقت؛ ۲) قابلیّت.

**هیل:** ۱) ڕەنگی قاوەیی ئاچـوخ؛ ۲) حیلەی ئەسپ؛ ۳) حولی، لوس‌و ساف ف ۱) رنگ قهوه‌ای روشن؛ ۲) شیههٔ اسب؛ ۳) صاف و لیز.

**هێل:** ۱) حێل، دەنکێکی بۆن‌خۆشـه؛ ۲) پاشگـرێکه بەمانا کەسێ که هێشـتن کاریەتی؛ ۳) مەیدانی جەنــگ؛ ۴) خوار، لار، چەوێل؛ ۵) شەڕنامه؛ ۶) جەنگە، هەڕەت؛ ۷) دارێکی لێڕەواره؛ ۸) درم، پەتا، ئازار، هال؛ ۹) هێز، وزه؛ ۱۰) بەکـۆمـه ڕۆین بۆ ڕاوی مەل‌و ماسی: (چونه هێلا کەوا)؛ ۱۱) جۆرێ تەڵه؛ ۱۲) لا، ئالی، تەرەف؛ ۱۳) هاوێردۆر، هەمولا؛ ۱۴) جەغز؛ ۱۵) زۆر، زەحف: (ئەو هێك **هێل** کولاوه)؛ ۱۶) ناو چەقی کۆزی هەڵپەڕکێ ف ۱) دانهٔ خوشبوی هِل؛ ۲) پسوند به معنی گذارنده؛ ۳) میدان جنگ؛ ۴) کج و ناهموار؛ ۵) جنگنامه؛ ۶) موسم، اوان؛ ۷) درختی است جنگلی؛ ۸) بیماری عمومی؛ ۹) نیرو، توان؛ ۱۰) شکـار دسـته‌جمعی پرنده و ماهی؛ ۱۱) نوعی تله؛ ۱۲) طرف، سو؛ ۱۳) دوروبر، همهٔ اطراف؛ ۱۴) دایره؛ ۱۵) بسیار؛ ۱۶) مرکز دایرهٔ رقص دسته‌جمعی.

**هێڵ:** ۱) خەتی جووت؛ ۲) پاشگری بەواتا: کەسێ که هێشتنەوه دەکا؛ ۳) مەیدانی شەڕ، شەڕگه ف ۱) شیار شخم؛ ۲) پسـونـد فاعلی هشتن، گذارنده؛ ۳) میدان جنگ.

**هیلا:** ۱) بەجێی‌هێشت؛ ۲) لێی‌گەڕا ف ۱) جاگذاشت؛ ۲) گذشت کرد.

**هیلاك:** ۱) مانـدو، شەکـەت، خەسـه؛ ۲) بقه، خەتەر؛ ۳) نەخۆشێ که لەمردن نزیك بێ ف ۱) خسته؛ ۲) خطر؛ ۳) بیمار بدحال.

**هیلاك‌بوون:** ۱) شەکـەت‌بوون، ماندوبوون؛ ۲) مردن ف ۱) خسته‌شدن؛ ۲) به هلاکت رسیدن.

**هیلال:** ۱) مانگیله، هەیڤـك، هێڤـك، مانگی یەکشـەوه؛ ۲) چیلکـەی دان‌ئاژن ف ۱) هلال ماه؛ ۲) خلال دندان.

**هیلالی:** تاق، سەردەروازەی بەتاق دروست‌کراو ف طاق سر در ورودی.

**هێلام:** ۱) هێشتم؛ ۲) جێم‌هێشت ف ۱) اجازه دادم؛ ۲) جاگذاشتم.

**هێلامازیا:** هەڕەتی مازوان ف موسم مازوچینی.

**هێلان:** ۱) لانـه، ماڵی باڵدار؛ ۲) هێشتن؛ ۳) گوم‌کردن؛ ۴) جوڵانەی گوریس ف ۱) آشیانه؛ ۲) هشتن، گذاشتن؛ ۳) گم کردن؛ ۴) تاب تاب‌بازی.

**هێڵان:** ۱) هێشتن، جێ‌هێشتن؛ ۲) هێشتن، ئیجازەدان ف ۱) هشتن؛ ۲) اجازه‌دادن.

**هێلاندش:** ونی، گومی، وندایی ف گمی، گم بودن.

**هیلاندن:** هاوارکردن له ئەسپەوه، حیلاندن ف شیهه کشیدن.

**هێلاندن:** ۱) هێشتن؛ ۲) گوم‌کردن ف ۱) هشتن؛ ۲) گم کردن.

**هێلانه:** لانه، لوونه، ماڵی پەڕنده، هێلین ف آشیانه.

**هێلانەدۆزە:** گەڕانی مامر بۆ جێگەی هێك‌لێ‌کرن ف جستجوی مرغ خانگی برای جای تخمگذاری.

**هێلانەدۆزی:** هێلانەدۆزه ف نگا: هێلانەدۆزه.

**هێلانەشێوان:** برێتی له ئاوارەو تەرەبوون ف کنایه از آواره و بینواشدن.

**هێلانەك:** جوڵانەی نەخۆش‌و منداڵ ف ننو.

**هێلانەواز:** لوونەواز، هێلانه لێ‌تێکچووگ ف کنایه از بینوا و آواره.

**هێلانین:** هەڵ‌هێنان، بڵندکردن ف بلندکردن.

**هیلاو:** ۱) پاك‌و خاوێن؛ ۲) ڕووت‌و بێ‌جلك؛ ۳) ڕەسەن‌و نەجیم‌زاده ف ۱) پاك و تمیز؛ ۲) لخت و عریان؛ ۳) اصیل و نجیب‌زاده.

**هیلاویستن:** هەڵاوەسین ف آویختن.

**هێل‌پسینگ:** گیایەکه ف گیاهی است.

**هێڵت:** دەهێڵێتەوه ف باقی می گذارد.

**هێلشتن:** هێڵان، ڕاگرتن ف هشتن، نگهداشتن.

**هیلك:** ١) جەرگ و ناو، دڵ و جەرگ و گورچیلە، مێلاك؛ ٢) خەسو؛ ٣) حیلکە، دەنگی بەرزی پێکەنین، قاقا، تریقە [ف] ١) دل و جگر و قلوه؛ ٢) مادرزن و مادرشوهر، مادر همسر؛ ٣) هرهرخنده.

**هێلك:** ١) هێك، هێ، خا؛ ٢) جۆلانەی گوریس [ف] ١) تخم پرنده؛ ٢) تاب تاب‌بازی.

**هێلکال:** مەنجەنیق، ئامرازێکی شەڕی کەونارایە [ف] منجنیق.

**هیلکان:** حیلکانەوە، بەتریقە خەنین [ف] هرهر خندیدن.

**هێلکان:** ١) لەجۆلانە نیشتن؛ ٢) هێلکال، مەنجەنیق [ف] ١) در تاب نشستن، تاب‌بازی؛ ٢) منجنیق.

**هێلکاندن:** ڕاژاندن لە جۆلانەدا [ف] نوسان دادن در تاب.

**هێل کردن:** ورد لێ ڕوانین [ف] به دقّت ملاحظه کردن.

**هیلکوهوڕ:** قاقا پێکەنین [ف] هرهر خندیدن.

**هیلکە:** ١) حیلکە، تریقە؛ ٢) هێك، خا [ف] ١) صدای خنده؛ ٢) تخم پرنده.

**هێلکە:** هێك، هێگ، خا، هێ [ف] تخم پرنده.

**هێلکەچێژتن:** هێك لەددران‌دان بۆ ئەزموونی ڕەقی و نەرمی [ف] استحکام تخم‌مرغ را با دندان آزمودن.

**هێلکەدان:** قونداغی مریشك، جێگەی هێلکە لە زگی مریشكدا [ف] تخمدان مرغ.

**هێلکەڕۆن:** هێك‌ڕۆن، هێ‌ڕۆن [ف] نیمرو.

**هێلکەڕێوی:** گیایەکە تۆمەکەی لە هێك دەکا [ف] گیاهی است.

**هێلکەشکانێ:** گەمەی هێك لێکدان لەسەر بردنەوە [ف] بازی تخم‌مرغ شکنی.

**هێلکەشکێنە:** هێلکەشکانێ [ف] بازی تخم‌مرغ شکنی.

**هێلکەشەیتانۆکە:** شەیتانۆکە [ف] حلزون.

**هێلکەکەر:** مریشکێ کە هێلکە دەکا [ف] مرغ تخمگذار.

**هیلکەوڕۆن:** هێ‌ڕۆن [ف] نیمرو.

**هێلکەوڕۆن:** هێ‌ڕۆن، خاوڕۆن [ف] نیمرو.

**هیلکەهیلك:** حیلکەحیلك، تریقەتریق [ف] هرهر خنده.

**هیلکین:** حیلکانەوە، بەقەو خەنین [ف] قاه‌قاه خندیدن.

**هێلگ:** ورگ، عور [ف] شکمبه.

**هێلانە:** لانە، لۆنە [ف] آشیانه.

**هێلانێ:** ١) جۆلانەی گوریس؛ ٢) هەڵپەڕکێی کیژۆڵان [ف] ١) تاب تاب‌بازی؛ ٢) رقص دختركان.

**هێلم:** ١) غەڕە، جۆرێ چریشی دارتاشان؛ ٢) پۆ، تیوەدان، فرێت [ف] ١) نوعی سریش نجّاری؛ ٢) پود قالیبافی.

**هێلم کاری:** کاری دارتاش بە هێلم [ف] کار با چسب نجّاری.

**هێلمە:** پۆ، فرێت [ف] پود قالیبافی.

**هیلمەڕۆ:** گای ڕەنگ‌قاوەیی ناوچاوسپی [ف] گاو قهوه‌ای پیشانی سفید.

**هێلنج:** هێق، دەنگی بەرلە ڕشانەوە، دەنگی ڕشانەوە [ف] تهوّع، صدای قی کردن.

**هێلنج‌دان:** حۆق کردن بۆ ڕشانەوە [ف] تهوّع، دل بهم آمدن.

**هیلۆ:** گیای ئەسپۆن، کەفکەفۆك [ف] گیاه چوبك.

**هێلۆق:** ١) نەخۆشی ئەندامانی شەرم، هالوق؛ ٢) تەرکی نێرینە، لوولەمیزی پیاو [ف] ١) نوعی بیماری آلت تناسلی؛ ٢) مجرای ادرار نرینه.

**هێلۆل:** گاڵتەجاڕ، گەپجاڕ [ف] مسخرهٔ مردم.

**هێلۆن:** ١) هێلانە؛ ٢) کالانی خنجەرو شیر [ف] ١) آشیانە؛ ٢) نیام خنجر و شمشیر.

**هیلە:** ١) حیلەی ئەسپ؛ ٢) فێڵ، حیلە؛ ٣) لاوازی لەهێزو توان کەفتگ [ف] ١) شیههٔ اسب؛ ٢) نارو؛ ٣) لاغر بی‌رمق.

**هێلە:** ١) ڕاوی باڵدارو ماسی؛ ٢) ئامرازی سواڵەت ساف کردن [ف] ١) شکار پرنده و ماهی؛ ٢) ابزار سفال صاف‌کن.

**هێلە:** ١) هێك، هێ، خا، هێلکە، هێلك، هێگ؛ ٢) وتەی گەڕاندنەوەی کاجووت بۆ سەر خەت؛ ٣) مرقەی نێری: (**هێلەهێلی نێری**) [ف] ١) تخم پرنده؛ ٢) کلمهٔ بازگرداندن گاو سرشیار شخم؛ ٣) نوعی صدای شاك.

**هیلەباز:** فێڵباز، دەسبڕ، گزیکەر [ف] حیله‌باز، حقّه‌باز.

**هێلەپەپە:** کولێرەی هێلکە تێهەڵسواو [ف] گرده نان اندوده با زردهٔ تخم‌مرغ.

**هێلەپەپێ:** زەردێنەو ئاردی پێکەوە سوورەوەکراو [ف] زردهٔ تخم‌مرغ و آرد با هم سرخ شده.

**هێلەساو:** ساف کردنی سواڵەت [ف] صاف کردن سفال.

**هێلەساودان:** بە هێلە ساوینەوە [ف] با ابزار صاف کردن.

**هێلەساوکردن:** ساف کردن بە هێلە [ف] صاف کردن سفال با «هێله».

**هێلەساوە:** هێلەساو [ف] نگا: هێلەساو.

**هێلەك:** ١) جۆرێ تەڵە؛ ٢) سواپ، بەردی لووس و پان و بچووك [ف] ١) نوعی تله؛ ٢) سنگ پهن وصاف و کوچك.

**هێلەکان:** ١) بادەوەی گەمیە: (فەلۆکا مە بهێلەکانێ دچە)؛ ٢) جۆلانە هەردوو جۆری [ف] ١) بادبان؛ ٢) ننو، تاب.

**هێلەکانی:** ١) حیلانی، سەماو ڕەخسی کچۆڵان؛ ٢) لە جۆلانە نیشتن [ف] ١) رقص دختركان؛ ٢) درتاب نشستن.

**هێلەگ:** ئامرازی ئارددابێژتن [ف] الك، آردبیز.

**هێلەگ بێژ:** بە هێلەگ دابێژراو [ف] بیخته با الك.

**هێلەگچی:** کەسێ کە هێلەگ چێ دەکا [ف] الك‌ساز.

**هێلەمارانێ:** هێلکەشکێنە [ف] بازی تخم‌مرغ شکنی.

**هێلەوایێ:** بانگ کردن بۆ مەیدانی جەنگ [ف] ندا برای رفتن به میدان جنگ.

**هێلەوە:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد [ف] روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**هێلەوەی:** کۆترەگایە [ف] کبوترچاهی.

**هیلەهیل:** حیلەحیل [ف] شیههٔ پیاپی اسب.

**هیلەهیلك:** هیلکەهیلك، تریقانەوە [ف] هرهر خنده.

**هیل هێلەك:** چەقەو گوڕەو زەنازەنا [ف] غوغا و همهمه.

**هیلی:** هاوێنه، عەینك، مریك، قوّدی، جام، قودیك ف آیینه.

**هێلی:** ۱) هێك، خا، هێ، هێگ، هێلك، هێلکە؛ ۲) ئاوێنـە ف ۱) تخم پرنده؛ ۲) آینه.

**هێلیڤان:** راوکە، رامك، مارکە ف نگا: مارکە.

**هێلیڤانك:** هێلیڤان ف نگا: مارکە.

**هێلیان:** هێلانە، لانە، لوّنە ف آشیانە.

**هێلین:** ۱) هێلانـە؛ ۲) هێلان، جێ‌هێشتن؛ ۳) گوم‌کردن؛ ۴) بریتی لە شەرمی ژن ف ۱) آشیانـە؛ ۲) هشتن، جاگذاشتن؛ ۳) گم کردن؛ ۴) کنایه از شرمگاه زن.

**هێلینك:** هێلانوکەی باڵداری پچوك ف آشیانهٔ پرندهٔ کوچك.

**هیم:** ۱) بناغە، خیم، بنچینەی خانو؛ ۲) بەردی زل، گاشە ف ۱) اساس، شالوده، زیر بنا؛ ۲) سنگ بزرگ.

**هێم:** ۱) هیم، خیم؛ ۲) خوّم، بوّخوّم؛ ۳) دێم، دەهێم؛ ۴) رەوشت‌و ئاکار؛ ۵) لا، نك، کن، ئالی ف ۱) اساس، شالوده؛ ۲) خودم؛ ۳) می‌آیم؛ ۴) روش و اخلاق؛ ۵) نزد.

**هێما:** ۱) ئیشارەت، عاشیرەت؛ ۲) هێشتان ف ۱) اشاره؛ ۲) هنوز.

**هێمان:** ۱) هێشتان؛ ۲) خوّمان؛ ۳) ماك، ماددە؛ ۴) سیایی فروّش ف ۱) هنوز؛ ۲) خودمان؛ ۳) عنصر، مادّه؛ ۴) فاکتور فروش.

**هێمچ:** بەرگ یان هەر قوماشێکی دازّراوی ونجڕونجڕ بوّگ، بزگوّر، تیتوّل ف پارچهٔ پوسیدهٔ پاره‌پاره.

**هیمداد:** ئاریکاری، کوّمەك ف امداد.

**هێمدانەر:** بناغەدانەر ف بنیانگذار.

**هێمدانین:** بناغەدانان ف بنیانگذاری.

**هیملو:** هەماری سوّتەنی، عەنباری ئێزنگ ف انبار هیمه.

**هیممەت:** ۱) پیاوەتی، چاکە؛ ۲) بڕیارو نەترسان ف ۱) مردانگی؛ ۲) تصمیم و قاطعیّت، همّت.

**هی‌من:** ئی‌من، شتی سەربەمن ف مال من، مربوط به من.

**هێمن:** ۱) ئارام، پشـو لەسـەرخـوّ؛ ۲) نازنـاوی شاعیری هەرەبەرزی هاوچەرخ بو کە لە سەرەتاکانی ساڵی ۱۳۶۵دا دنیای بەجێ‌هێشت ف ۱) آرام، شکیبـا؛ ۲) تخلّص شاعر بلندپایهٔ معاصر کرد که اوایل سال ۱۳۶۵ بدرود حیات گفت.

**هێمنایەتی:** دنیای ئارامو بێ کێشەو شەڕ ف آرامش، امنیّت، دنیای صلح.

**هێمنایی:** ئارامی ف آرامش.

**هێمن بوُنەوە:** پاش شێویان ئارام‌بوُن ف آرامش از سرگرفتن.

**هێمن کردنەوە:** ئارام‌کردنەوە ف آرامش دادن.

**هێمنەتی:** ئارامی ف آرامش.

**هێمنی:** ۱) لەسەرخوّیی؛ ۲) ئاسودەیی وڵات ف ۱) آرامی؛ ۲) امنیّت کشور.

**هێمنیەتی:** هێمنایەتی، هێمنایی ف نگا: هێمنایەتی.

**هێموّ:** ۱) داوێن‌پاك؛ ۲) ناوی ژنانە ف ۱) پاکدامن؛ ۲) نام زنانه.

**هێمە:** ۱) لکەداری هەڵپەرتاوتە؛ ۲) ئێزنگ ف ۱) شاخه‌های هرس شده؛ ۲) هیمه.

**هیمی:** ۱) بناغەیی؛ ۲) بەردین ف ۱) اساسی؛ ۲) سنگی.

**هیمێ:** گونـدێکـە لە کوردستـان بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**هێمی:** ۱) قوماشی زوّر ناسکی بەرگەنەگر؛ ۲) شێ، نم، تەڕایی زەوین ف ۱) پارچهٔ نازك کم دوام؛ ۲) نم، رطوبت.

**هێمێ:** ۱) داوێن‌پاك، هێموّ؛ ۲) ناوی ژنانە ف ۱) پاکدامن؛ ۲) نام زنانه.

**هێمیتی:** شێ، تەڕایی زەوی، هێمی ف نم، رطوبت زمین.

**هێمـــین:** ۱) رزاو، پواو؛ ۲) نم‌کێشـــاو، شێدار ف ۱) پوســیده؛ ۲) رطوبت‌زده، نم کشیده.

**هین:** ۱) دەم، کات، تاو؛ ۲) هی، ماڵی، تایبەتی: (ئەم‌کتێبە هین‌منە)؛ ۳) وانێك، تشت، واك، هەرامـە، هەنـوّکـە؛ ۴) فێر، هوّین، هەڤـوّت؛ ۵) زانست؛ ۶) های، هەواڵو خەبـەر؛ ۷) دەسا، دەی: (هین چێتر)؛ ۸) ئەوان؛ ۹) ئەوانە ف ۱) دم، لحظه؛ ۲) ویژه، منسوب به؛ ۳) چیز، آن چیز؛ ۴) تعلیم، آموزش؛ ۵) علم، دانش؛ ۶) آهای، خبر، خبردار؛ ۷) یاالله، ادامه بده؛ ۸) آنها؛ ۹) اینها.

**هێن:** ۱) پاشگری بەواتا: ئەوی دەهێنێ: (نان‌هێن، ئاوهێن)؛ ۲) ئاوها؛ ۳) ئەوەنـدە، هێنـد؛ ۴) کانی؛ ۵) ناوچـەیەکـە لای دیاربەکر ف ۱) پسوند به‌معنی آورنده؛ ۲) چنین؛ ۳) اینقدر؛ ۴) چشمه؛ ۵) ناحیه‌ای درکردستان.

**هینا:** ۱) هێنا، ئاورد؛ ۲) زانا، دڵوشیار، زوّر بەزەبر لە فێر بوُندا؛ ۳) هەر ئێستـە، نوّکـە، نهـوّ؛ ۴) دیسـان پتـر؛ ۵) بەمزوانـە، تازەگی: (هینا زەوجێ‌یە) ف ۱) آورد؛ ۲) آمـوزش دیده و ماهر؛ ۳) همین الآن؛ ۴) بازهم بیشتر؛ ۵) تازگی، به‌تازگی.

**هێنا:** هاورد، ئاورد: (نانی هێنا، کتێبی هێنا) ف آورد.

**هێنان:** هاوردن ف آوردن.

**هێنانەبەر:** پێ‌گەیاندن ف به‌ثمر رساندن.

**هێنانەبیر:** بیرخستنەوە ف یادآوری کردن.

**هێنـــانـــەجێ:** ۱) ئەنـــدامی وەرگەڕاوو لەجێ‌چوُ چاکـــردنـەوە؛ ۲) بەجێ‌هێنان، پێك‌هێنان ف ۱) اندام دررفته را معالجه‌کردن؛ ۲) انجام دادن کار.

**هێنـانـەوە:** ۱) گێڕانەوە: (کەرەکەم ڕوّیبو هێنامەوە)؛ ۲) ناوکی کەوتو چارەکردن؛ ۳) هێنانەجێی ئەندامی وەرگەڕاو؛ ۴) نان دەتەندوُری گەرم کەوتن ف ۱) بازگردانـدن؛ ۲) ناف افتاده (نوعی بیماری) را علاج کردن؛ ۳) اندام دررفته را جاانداختن؛ ۴) نان از گرمی در تنور افتادن.

**هێنانەوەجێ:** چارکردنی ناوکو ئەندامی لەجێ‌چوُگ ف معالجهٔ ناف و اندام ازجا دررفته.

**هێنانەوەیاد:** بیرخستنەوە ف یادآوری کردن.

**هێنانەوەیەك:** وێك‌هێنانەوە ف بازبهم آوردن.

**هین بوُن:** هوّین‌بوُن، هەڤوّتن، راهاتن، فێربوُن ف یادگرفتن، آموزش دیدن.

**هین بویی:** راهاتو، فێر بوُگ، خوێندەوار ف آموزش دیده، باسواد.

**هینجان:** ئاو دەرهێنان لە شتی قوُڵ، هەڵێنجان ف مایع را با ظرف برکشیدن.

**هینجانە:** ۱) شاکاشی، ئینجانە؛ ۲) تەشتی هەویر لە سواڵەت ف ۱) شهکاسه؛ ۲) تشت سفالی برای خمیر.

**هینجە:** حینجە، خوێندنەوە بە سەرو ژێر و بۆرەوە ف تهجّی کلمات.

**هینجەت:** هەنجەت، بەهانە: (چمنەکردوە هەر لیم بە**هینجەتە**) ف بهانه.

**هێنجەت:** هینجەت، بەهانە ف بهانه.

**هیند:** ۱) هەن، هند، ئەند، باز؛ ۲) وڵاتێکە؛ ۳) هەرچەند ف ۱) اند؛ ۲) هندوستان؛ ۳) هرچند.

**هێند:** ۱) چەنێ؛ ۲) ئەوەندی؛ ۳) کەم ف ۱) هرچند؛ ۲) چندی؛ ۳) اندك.

**هیندار:** ۱) فێرکار، ماموّستا، سەیدا، دەرسبێژ، وانەوێژ؛ ۲) خوێندەوار ف ۱) معلّم؛ ۲) درس خوانده.

**هینداری:** ۱) پیشەی فێرکار، کاری وانەوێژ؛ ۲) خێندەواری ف ۱) آموزگاری؛ ۲) باسوادی.

**هیندویی:** جۆرێ هەنی، جەبەش، شمتی، شوُتی ف نوعی هندوانه.

**هیندە:** دام‌و دەزگایەکی زل کە زۆرکەس لە کارێکا هاوکارین ف مؤسّسه.

**هێندە:** ۱) ئەوەندە؛ ۲) ئەوەندی ف ۱) این اندازه؛ ۲) هرچند.

**هێندەی:** ۱) ئەوەندەی: (**هێندەی** نەدامێ)؛ ۲) هەرچەندە: (**هێندەی** من دەگەڵیا ماندوُبوُم) ف ۱) این اندازه؛ ۲) هرچند.

**هێندی:** ۱) ئەوەندی؛ ۲) بەئەندازەی: (**هێندی** دەنکەنۆکێك) ف ۱) آنقدر؛ ۲) به‌اندازهٔ.

**هێندێ:** چکێ، کەمێ لە شتێ ف اندکی، بعضی.

**هێندێك:** ۱) کەمێك لە شتێ؛ ۲) بازەکەسێ ف ۱) اندکی؛ ۲) بعضی اشخاص.

**هێنژین:** ۱) وەنەوزدان؛ ۲) داهێزان لە بێ‌خەوی ف ۱) چرت زدن؛ ۲) از بیخوابی خسته شدن.

**هێنك:** فێنْك، هوُێنك، هۆنْك ف خنك.

**هینکار:** ۱) فێرکار؛ ۲) توێژەرەوە ف ۱) آموزگار؛ ۲) پژوهشگر.

**هینکاری:** ۱) کاری‌هینکار؛ ۲) توێژینەوە ف ۱) آموزگاری؛ ۲) پژوهش.

**هێنکایی:** فێنکایی، هوُێنکایی ف خنکی.

**هین کرن:** فێرکردن، هەڤوتن، هوُین کرن، هێ کرن ف آموختن، آموزش دادن.

**هینکو:** کەوابێ، جا کەوایە ف اگر چنین باشد، حال که چنین است.

**هینکەر:** فێرکار ف آموزگار.

**هینگا:** ۱) ئەوسا، ئەودەم؛ ۲) ئێستە، نوُکە، نهۆ، ئیسە، ئەلحان ف ۱) آنگاه؛ ۲) اکنون.

**هینگامە:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**هینگاوێ:** جا ئەوسا ف پس آنگاه.

**هینگە:** فێرگە ف آموزشگاه.

**هینگی:** ئەوسا ف آنگاه.

**هینگێ:** ئەوێ‌دەمێ ف آن زمان.

**هینگین:** هنگین، ئەودەم ف آنگاه، آنوقت.

**هێنەر:** ۱) کەسێ کە شتێ دێنێ؛ ۲) پڕ بە قیمەت، هێژایی: (با یادی گوڵم دڵم دەرێنێ / دڵداری هەزار ئەوەندە **دێنێ**) «مەم‌و زینی خانی» ف ۱) آورنده؛ ۲) ارزش.

**هینی:** ۱) کانی، سەرچاوە؛ ۲) ئەوجۆرە، بەم‌جۆرە ف ۱) چشمه؛ ۲) بدینسان.

**هێو:** ۱) هێف، هێڤ، تماشا، فت؛ ۲) کێشەو هەڵلا، ئاژاوە؛ ۳) وشەی گەمەپێ کردن: (**هێو** تەڕت نەکرد)؛ ۴) نم، شێ ف ۱) نگاه؛ ۲) آشوب و بلوا؛ ۳) کلمهٔ تمسخر؛ ۴) نم، رطوبت.

**هیوا:** هومێد ف امید.

**هیوابڕین:** ناهومێدبوُن ف ناامیدشدن.

**هیوات:** ۱) دەردو ژانی زۆر؛ ۲) هومێدت ف ۱) درد و الم شدید؛ ۲) امیدت.

**هیوادار:** بەهومێد ف امیدوار.

**هێوار:** ئێوار ف عصرهنگام.

**هێوارە:** ئێوارە ف عصرهنگام.

**هێوارێ:** لە ئێوارەدا ف درهنگام عصر.

**هێواش:** بەسپایی، لەسەرخۆ، هێدی ف یواش، آهسته.

**هێوان:** هەیوان ف ایوان، سکوی سرپوشیده، تراس.

**هێوایی:** ۱) شێ، نم، تەڕایی ڕوەك؛ ۲) تیراوی ف ۱) نم، رطوبت؛ ۲) سیرابی، پرآبی.

**هێوچی:** ئاژاوەچی، فتنە، مایەفتنە، سەرەسۆدرە ف آشوبگر.

**هێوْر:** ۱) هێمن، هێدی، ئارام؛ ۲) پەناگا، داڵدە؛ ۳) ئەنوا، جێگە؛ ۴) بوێری، ئازایی، نەترسان ف ۱) آرام؛ ۲) پناهگاه؛ ۳) مسکن؛ ۴) شجاعت.

**هێوراندن:** ۱) هێدی کردنەوە؛ ۲) پەنادان؛ ۳) جێگە پێ‌دان؛ ۴) غیرەت وەبەرنان ف ۱) آرام کردن؛ ۲) پناه دادن؛ ۳) اسکان دادن؛ ۴) تشجیع کردن.

**هێوْربوُن:** ئارام‌گرتن، داسەکنان، هەدادان ف آرام گرفتن.

**هێوْربوُنەوە:** ئارام‌بوُنەوە، داسەکنان ف آرامش بازیافتن.

**هێورین:** ۱) ئارام‌گرتن، هێدی‌و هێمن‌بوُنەوە؛ ۲) حاوانەوە لەبن باڵی کەسێکا؛ ۳) نەترسان؛ ۴) جێگە دەسکەوتن ف ۱) آرامش بازیافتن؛ ۲) درپناه کسی امنیّت یافتن؛ ۳) شجاع بودن، نترسیدن؛ ۴) جای سکونت یافتن.

**هێوشین:** بەسەرچوُنی چاخی تەڕەکاری‌و بێستان، هێڤشین ف سرآمدن موسم صیفی کاری.

**هێولا:** هەڵوا ف حلوا.

**هێوْن:** هێمن ف آرام.

**هێوناشیایەنە:** لەخەوهەستان ف ازخواب برخاستن.

**هێۆنی:** هێمنی ف آرامش.

**هێوە:** ١) هەیوە، بەهێ، بێ؛ ٢) بۆ ئێرە: (هێوە وەرە) ف ١) میوهٔ به؛ ٢) به این سو.

**هیوەر:** برای مێرد ف برادرشوهر.

**هێوەر:** هیوەر ف برادرشوهر.

**هێوەرزا:** فرزەندی هێوەر ف برادرزادهٔ شوهر.

**هێوەرژن:** براژنی مێرد ف زن برادر شوهر.

**هێوەرە:** گامێشی سێ ساڵە ف گاومیش سەساله.

**هیوی:** نمدار، شێدار، شەدار ف نمناك.

**هێوی:** ١) تکا، رەجا، پاڕانەوە؛ ٢) هومێد، هومێ؛ ٣) شێ، هێمی، نم؛ ٤) شەونم، ئاونگ ف ١) خواهش؛ ٢) امید؛ ٣) نم، رطوبت؛ ٤) شبنم.

**هێویتی:** تەڕایی زەمین، شێ ف رطوبت زمین.

**هێویدار:** بەهومید ف امیدوار.

**هێوین:** ئامیان، هەوێن ف مایهٔ پنیر و ماست.

**هیەرس:** سی، بیستو دە ف عدد سی.

**هی هی:** ١) دەنگی پێکـەنینی کەمتـر لە قاقـا؛ ٢) دەنگی گریانی بە نوکەنوك ف ١) صدای خندهٔ آهسته؛ ٢) صدای گریهٔ آهسته.

**هێ هێ:** ١) وتـەی بانـگ کردنی مێگـەل؛ ٢) وتـەی گاڵتـەپێ کردنو باوەڕنـەکردن ف ١) کلمـهٔ صداکـردن گله؛ ٢) کلمهٔ تمسخر و باورنکردن.

**هیهیکەرە:** باڵندەیەکە شەو ناخەوێو دەنگی وەك ئەوە وایە بڵێ هی هی ف پرندەای است شب بیدار.

**هێی:** هیت، شەدار، تەڕ ف نمناك.

**هێی:** وتەی دەنگدان: (**هێی** ئەوە چدەکەی؟) ف حرف ندا.

**هێی ریس:** هیرس، سی، سێ چەلدە ف عدد سی.

**هیی زوا:** تەڕووشك کە بۆ گرۆ دەکرێ ف نوعی قرعەکشی.

**هی یەی:** تلیساو، تەڕبوگ ف خیس شده.

**ی:** ١) دوامین پیتی ئەلف‌وبێتکەی عـارەبی‌یە. کـە عارەبیش لـە *ئارامیەکانیەوە بە میرات بۆی بەجێ ماوە کە بیست‌وشەش پیتی ئەنگ‌و پێنج بزاوەو کورتە بزاوێکی ڕاگری هەیـە بەکـوردی ناویان‌نـاوە زەنەو نیـازیان وایـە دەبێ لەسـەری ڕابوەستن؛* ٢) ئامرازێکی ڕێزمانی‌یە مانای تایبەتی بەخاوەنی دەگەیەنێ: (حەمەی وسوان، بایزی پیروت)؛ ٣) بە پاشلی وشەوە بنوسێ تاکی دەگەیەنێ: (پیاوێ، کوڕێ)؛ ٤) ئامرازی خەبەردانە: (بەهار نایێ لەسەرمایی خەلاس بین) [ف] ١) آخرین حرف خط عربی؛ ٢) علامت اضافۀ ملکی؛ ٣) پسوند وحدت؛ ٤) پسوند خبری.

**یا:** ١) ئی، ئە، لە زیادی دێت وەك دە: (دە لوُسـە، ئی باشە، ئە چاکە، یا خۆشـــە)؛ ٢) ئان، نا، نام، بۆ نێوان‌خستن: (یا بچـــۆ یا بنـــو)؛ ٣) ملکایەتی تایبەتی بۆ ژن: (یا منە نادمەتە)؛ ٤) ئەوشتەی، ئەوکەسەی، ئەوی: (یا تە کری، یا تە گۆتی)؛ ٥) جێ، شوێن: (یاگە)؛ ٦) وتـەی ڕێزگرتن بۆ ژنی جێ‌گەورە لە دواندندا: (یامروت، یاشەم، یازێڕن)؛ ٧) ئامۆژگاری: (تەگبیر ب یا من دکی هۆ بکە)؛ ٨) وشەی بانگ‌کردن بۆ دەهـانـاهـاتن: (یاغـەوس، یاخزرێ کال)؛ ٩) بۆ داکوتان: (ماشەلا کوڕێ تەیا مەزن بوُیە)؛ ١٠) ئەو؛ ١١) بەڵێ؛ ١٢) ئەی؛ ١٣) وەکری، ئاواڵە [ف] ١) حرف تأکید؛ ٢) یا؛ ٣) حرف ملکیّت مؤنث؛ ٤) آن چیز، آن کس؛ ٥) جای، مکان؛ ٦) کلمۀ احترام خطاب به بانوی محترم؛ ٧) کلمۀ راهنمایی؛ ٨) کلمۀ استغاثه، استمداد؛ ٩) حرف تأکید؛ ١٠) او؛ ١١) بلی؛ ١٢) ای، حرف ندا؛ ١٣) باز، گشوده.

**یاب:** دەسکەوت: (نایاب) [ف] دستاورد.

**یاباش:** لەسەرخۆ، هێدیکا، سەبرۆکە [ف] آهسته، یواش.

**یابان:** بیابان، سارا، چۆلگە [ف] بیابان.

**یابان‌راچەرایش:** ژیان لە بیابان، دوُر لە ئاوایی ڕابواردن [ف] زندگی در بیابان.

**یابان کەوتش:** وەچۆل کەوتن، دانەسارا [ف] به صحرا زدن

**یابانی:** بیاباتی، چۆل‌پەرست [ف] بیابانی.

**یابانیەی:** سارانشینی، چۆل‌پەرستی [ف] بیابان‌نشینی.

**یابڕ:** جیرە بۆ فەقیرو هەژاران [ف] جیرۀ فقرا.

**یابۆ:** ١) بانگ‌کردن لە باوك؛ ٢) هاوار لە ئێش‌و بەلایە، وەی‌بابە [ف] ١) کلمۀ خطاب به پدر؛ ٢) کلمۀ گله از درد.

**یابوُ:** ١) ئەسپی نانەجیبی بارکێشان؛ ٢) بریتی لە پیاوی نەزانی تەمەڵ [ف] ١) یابو؛ ٢) کنایه از نفهم تنبل.

**یابۆن:** یابان، بیاوان، سارا [ف] بیابان.

**یابە:** بنیات، ئیجاد [ف] بنیاد، ایجاد.

**یابەکردن:** بنیات‌نان، دروس کردن [ف] ایجادکردن.

**یاپراخ:** ١) گەڵامێو؛ ٢) دولمەی گەڵامێو، ئاپراخ [ف] ١) برگ مو؛ ٢) دلمۀ برگ مو.

**یاپراغ:** یاپراخ [ف] نگا: یاپراخ.

**یاپنجی:** ١) دێـوجامە؛ ٢) فـەرەنجی [ف] ١) نگا: دێـوجامە؛ ٢) نگا: فەرەنجی.

**یاتاخ:** ١) نوێن، نقین، کەل‌پەلی پێ‌خەوتن، پێخەف؛ ٢) جێ، ماوا [ف] ١) رختخواب؛ ٢) جا و مکان.

**یاجوج:** ئاجوج، عاجوج [ف] یأجوج.

**یاجـوج‌باجوج:** ١) عاجوج‌ماجوج؛ ٢) بریتی لە هەزارەزیلە، خەڵکی زۆری تێکەڵ‌پێکەڵ [ف] ١) یأجوج مأجوج؛ ٢) کنایه از شلوغی و بی‌نظمی.

**یاجێراینە:** بەرەوپاش گەڕانەوە [ف] به‌عقب برگشتن.

**یاخر:** باران [ف] باران.

**یاخچـە:** گونـدێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد [ف] از روستاهای ویران شدۀ کردستان توسط بعثیان.

**یاخسـەمـەر:** لەو گونـدانـەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد [ف] روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**یاخمە:** تالان، پوێر، پوُڕ [ف] غارت.

**یاخمەوۆ:** شتی وا هەیە؟، کاری وا ئەکرێ [ف] چنین چیزی ممکن است؟.

**یاخۆ:** ئان، نام، نا، یا [ف] یا اینکه.

**یاخوا:** وتەی ئاواتخوازی: (**یاخوا** باران بباریٚ) ف حرف تمنّا، کاشکی.
**یاخوت:** یاخوٚ ف یااینکه.
**یاخود:** یاخوٚ ف یااینکه.
**یاخون:** مەلای شیعە ف آخوند.
**یاخە:** پێسیر، بەروٚ ف یقه.
**یاخەر:** باران ف باران.
**یاخی:** ۱) سەربزێو، شەقی؛ ۲) چیای هەڵەموٗت؛ ۳) چەمی بیٚبوار؛ ۴) مانگرتو ف ۱) متمرّد، یاغی؛ ۲) کوه صعب‌العبور؛ ۳) رودخانهٔ بی‌گدار؛ ۴) اعتصاب کرده.
**یاخیان:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.
**یاخی‌بوٗن:** ئەشقی‌بوٗن ف یاغی شدن.
**یاخی گەری:** سەرکێشی، سەربزێوی ف سرکشی، تمرّد.
**یاد:** ۱) باس‌کردنی کەسیٚ کە نادیارە: (**یادی** توٚمان دەکرد)؛ ۲) بیر، بیرەوەری: (**لەیادمە**، **لەیادم**نەماوە) ف ۱) ذکر و یاد کسی در غیابش؛ ۲) یاد، حافظه.
**یاداشت:** نوسینی مەبەست بوٚ لەبیرنەچوٗن ف یادداشت.
**یاداوەر:** وەبیرهاتنەوە: (من تازە **یاداوەر**بوٗم کە توٚ لێرە نەبوٗی) ف به‌یاد آمدن.
**یاداوەری:** بیرهێنانەوە: (ئەوەك لەبیرم بچیٚ توٚ **یاداوەر**یم بکە) ف به‌یاد آوردن.
**یاددان:** فێرکردن ف یاددادن.
**یادکردن:** ۱) تاسەکردن؛ ۲) باس‌کردنی دوٗربەدوٗر ف ۱) مشتاق بودن؛ ۲) یاد و ذکرِ غیابی.
**یادکردنەوە:** وەبیرهاتنەوەی نادیار ف یادکردن.
**یادگار:** ۱) دیاری بوٚ لەبیرنەچوٗنەوە؛ ۲) ئاسەواریٚ کە دەبێتە هوٚی لەبیرنەچوٗنەوە: (ئەم قەڵایە **یادگاری** پێشوٗنانە) ف ۱) هدیهٔ یادگاری؛ ۲) آثار.
**یادگاری:** یادگار ف نگا: یادگار.
**یادن:** ئەوی دیکە، ئەوی‌تر ف آن دیگری.
**یادنامە:** دەفتەری بیرەوەریان ف دفتر خاطرات.
**یادەرە:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.
**یادەست:** وتەیەکە قومارچی بوٚ بردنەوە ئێژنی ف تکیه‌کلام قماربازان که به قصد برد گفته می‌شود.
**یادی:** یادن، ئەویکە ف آن دیگری.
**یادیٚ:** ۱) دایك، دا؛ ۲) وتەی بانگ‌کردنی داك ف ۱) مادر؛ ۲) کلمهٔ خطاب به مادر.
**یار:** ۱) هەواڵ، ئاواڵ، رەفیق؛ ۲) گراوی، دڵبەر، ماشقە؛ ۳) خاوەن: (**بەختیار**، **وشیار**)؛ ۴) کەر، کارکەر: (**جوتیار**، **کڕیار**، **فروٚشیار**)؛ ۵) پاشگرێکە چاوگەیی دەدا بە وشە: (بڕیار، پرسیار)؛ ۶) یاریکار: (**خوا یاربیٚ**) ف ۱) دوست، رفیق؛ ۲) معشوقه؛ ۳) صاحب؛ ۴) کنندهٔ کار؛ ۵) پسوندی است که فعل را به مصدر تبدیل می‌کند؛ ۶) کمك کننده، یاور.
**یارا:** ۱) ئەی یار. *لە سەرەتای گوٚرانی دەیڵێن*؛ ۲) تابشت‌وتوان ف ۱) ای یار؛ ۲) تاب وتوان، یارا.
**یارامە:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.
**یاران:** ۱) دوٚستان؛ ۲) دڵبەران؛ ۳) هوٚگر، ئەوەی خوٗ بەدوٚستایەتیەوە دەگریٚ ف ۱) دوستان؛ ۲) دلبران؛ ۳) انیس.
**یاران‌بەگی:** گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.
**یارانیەن:** ۱) گەپ‌و گەمە، یاری‌کرن؛ ۲) بەقەستی نە بەڕاستی ف ۱) بازی و سرگرمی؛ ۲) به‌شوخی، مقابل جدّی.
**یاڕبی:** هاوار لە توٚ خوایە، یاڕەببی ف یاربّ، خدایا.
**یارد:** پێوانەیەکی قوماشە نەوەدو دوسەتەمی میترەو چاردە گریٚ بە گەزی کوردی‌یە ف یارد انگلیسی.
**یاردم:** یاریدە، ئاریکاری ف کمك، مساعدت.
**یاردە:** یارد ف یارد.
**یارك:** یاری چکوٚڵە، بوٚ خوٚشەویستی دەڵێن ف یار کوچولو.
**یارکوٚك:** گێزەر، بنی گیایەکە لەتیرەی توٗرە تامی شیرینەو دەرمانی چاوان‌و پوٗك‌و ددانانە ف هویج.
**یارم:** ۱) دڵبەری من؛ ۲) نیوەو نیوەچل: (کاورا **یارم** پیاگە)؛ ۳) کاری هەرزەو سوٗك ف ۱) یار من؛ ۲) نیم، نیمچه؛ ۳) کار هرزه.
**یارما:** بڕکەبێستان ف بوتهٔ پالیزی.
**یارمباز:** جلف‌و بلح ف هرزه‌کار، شارلاتان.
**یارمە:** ۱) دوٚستی منە؛ ۲) قەڵشاو؛ ۳) کەندالی کوٗڕ، هەڵەت؛ ۴) جوٚریٚ قوماشە ف ۱) دوست من است؛ ۲) ترك برده؛ ۳) پرتگاه؛ ۴) نام نوعی پارچه است.
**یارمەتی:** ئاریکاری، کوٚمەگ ف کمك، مساعدت.
**یارمەتی‌دان:** کوٚمەگ‌کردن ف کمك کردن.
**یارمەتی‌دەر:** ئاریکار ف یاری دهنده، کمك کننده.
**یارمەتی کردن:** ئاریکاری‌کردن، یارمەتی‌دان ف کمك کردن.
**یارو:** ئارو، هارو، هارویٚ، خەیار ف خیار.
**یاروٚ:** فلانی، کاورا ف یارو.
**یاروئەخیار:** دوٚست‌و بیانی ف دوست و بیگانه.
**یاروئەغیار:** یاروئەخیار ف دوست و بیگانه.
**یاروٚکە:** ۱) کاوراکە، ئەوەکەی دەزانی؛ ۲) یاری چکوٚڵە، یارك ف ۱) آن یارو؛ ۲) یار کوچولو.
**یاروەلی:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.
**یاڕەببی:** یاڕبی، هاوار لە توٚ خودایە ف یاربّ، خدایا.
**یاڕەبی:** یاڕەببی ف یاربّ.
**یارەڵماسی:** پەتاتە، سێف‌زەمینە، سێب‌زەمینی ف سیب‌زمینی.

**یارەما:** یارما [ف] بوتهٔ پالیزی.

**یارەمەز:** یارمباز، جلّفو سوُك [ف] هرزه.

**یاری:** ١) لاری، وازی، گەمـە، قومـار، گاڵته، کایه؛ ٢) ئاریکاری؛ ٣) دۆستایەتی؛ ۴) ئەوین [ف] ١) بازی؛ ٢) کمك؛ ٣) دوستی؛ ۴) عشق.

**یاریده:** ١) کۆمـەگ، ئاریکـاری؛ ٢) ئاریکـار [ف] ١) کمـك؛ ٢) کمك کننده، یاری دهنده.

**یاریدەدەر:** ئاریکار [ف] یاری دهنده.

**یاریدەر:** ئاریکار [ف] یاری دهنده.

**یاریکار:** ئاریکار [ف] کمك کننده، یاری دهنده.

**یاری کردن:** ١) وازی کردن؛ ٢) ئاریکاری کردن [ف] ١) بازی کردن؛ ٢) کمك کردن.

**یاری کرن:** یاری کردن [ف] نگا: یاری کردن.

**یاریکەر:** ١) وازیکەر؛ ٢) ئاریکار [ف] ١) بازیکن؛ ٢) یاور.

**یاریه:** یاریده، ئاریکاری [ف] کمك.

**یاز:** ١) زیپکـه له چرّوچـاوی ساوا؛ ٢) نوسـراو [ف] ١) جوش صورت نوزاد؛ ٢) نوشته.

**یازخـانـه:** ١) دیوی نوُسینی بەکـۆمـەڵ، دەفتـەرخـانـە؛ ٢) میزی لەسەرنوُسین [ف] ١) دبیرخانه؛ ٢) میز تحریر.

**یازده:** ئێكو ده [ف] عدد یازده.

**یازدەمین:** یەکێ پتر له دەیەمین: (ئەوە **یازدەمین** جاره پێت دەڵێم) [ف] یازدهمین.

**یازدەهەم:** ئەوەی ژماره یازدەی بەردە کەوێ [ف] یازدهم.

**یازدەهەمین:** یازدەمین [ف] یازدهمین.

**یازمه:** کۆچکەی سەری منداڵان [ف] نوعی سرپوش کودکان.

**یازو:** ئەوشتەی بەرێ [ف] آن چیز پیشین.

**یازوخ:** حەیف، بەداخەوە، مخابن [ف] دریغ.

**یازوغ:** یازوخ [ف] دریغ.

**یازویابان:** دەشتو سارا، چوُڵو بیابان [ف] دشت و بیابان.

**یازی:** ١) یازو؛ ٢) چولگەو بیابان [ف] ١) نگا: یازو؛ ٢) هامون و بیابان.

**یازیبلاخی:** ناوی گوندێکی کوردستانه [ف] نام روستایی است.

**یاس:** ١) تاتـەبـەرد، بەردی پانو لوُس؛ ٢) دارگوڵێکی بنچکه گوڵێکی سپی چکۆڵەی بەهێشو دەگرێ زۆر بۆنخۆشه؛ ٢) ناوه بۆ پیاوانو بۆ ژنان: (سم سمی کەرێ چنگ چنگی **یاسێ** / من لەم مەسەله سەرم ئەتـاسێ) «مـەسەل»؛ ٣) ترس، مەترسی [ف] ١) تختەسنگ؛ ٢) گُل یاس؛ ٣) نامی مردانه و زنانه؛ ۴) ترس، خوف.

**یاسا:** ١) دامو دەستوُر، رێوشوێنی ناو کۆمەڵ؛ ٢) قانوُنی دەوڵەت [ف] ١) روش و شیوه؛ ٢) قانون.

**یاساخ:** قەدەغە، نارەوا لای خەڵك [ف] ممنوع.

**یاساغ:** یاساخ [ف] ممنوع.

**یاساك:** لەو گوندانەی کوردستانه که بەعسی کاولیان کرد [ف] روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**یاسامال:** گوندێکه له کوردستان بەعسی وێرانی کرد [ف] از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**یاساوڵ:** کێشکچی [ف] یساول.

**یاساین:** ١) فیتولێدان؛ ٢) فیتفیته [ف] ١) سوت زدن؛ ٢) سوت.

**یاسایی:** ١) به رێوشوێنی کۆمەڵ، ئاسایی؛ ٢) بەر قانوُن کەوته [ف] ١) عادی؛ ٢) قانونی.

**یاستوخ:** باڵگه، سەرین، سەنیر [ف] بالش.

**یاسەمەن:** ١) داردەوەنێکه له سەرەبەهاردا گوڵی سپی یان بنەوشی زۆر بۆنخۆش دەکا؛ ٢) ناوه بۆ ژنان [ف] ١) یاسمین؛ ٢) نام زنانه.

**یاسەمەنه:** یاسەمەن [ف] یاسمین.

**یاسەمین:** یاسەمەن [ف] یاسمین.

**یاسیکەند:** گوندێکه له کوردستان [ف] نام دهی است.

**یاسین:** ١) بڕگەیەکـه له قورعان بەتایبەتی لەسەر نەخۆشی دەخوێنن: (هێند زوُ گیانی دەرچو **یاسینی** پێڕانەگەیشت)؛ ٢) ناوه بۆ پیاوان [ف] ١) سورهٔ یاسین؛ ٢) نام مردانه.

**یاسیناوێ:** گوندێکه له کوردستان [ف] نام دهی است.

**یاشا:** خۆزیا [ف] کاش.

**یاشرمه:** هاشرمه، هێشرمه [ف] نگا: هاشرمه.

**یاشماخ:** مێزەر، پێچی سەری پیاوان [ف] دستار مردانه.

**یاغی:** یاخی [ف] نگا: یاخی.

**یاغێتی:** ئەشقی گەری [ف] تمرّد.

**یافا:** قسەی ناحەز، درۆ [ف] یاوه.

**یافت:** شوێپ، شوێنەوار [ف] رد، اثر.

**یافتبڕین:** شوێنەونێ، ئاسەوارنەهێشتن [ف] رد گم کردن.

**یاقما:** تالاّن، پوُڕ، پوُیر [ف] یغما، تاراج.

**یاقـۆ:** سوُکـەنـاوی یەعقـوب، ناوی پیاوانـه: (سـەی **یاقۆ** شاعیرێکی خواپەرست بو) [ف] مخفّف یعقوب.

**یاقوب:** یاقۆ، ناوی پیاوانه [ف] یعقوب.

**یاقوبی:** جۆرێ دەمانچه [ف] نوعی هفت‌تیر.

**یاقـوت:** ١) کەس یان شتـە کورتـەکـه؛ ٢) شت یان کەسـه سڵو قوشقی‌یەکه [ف] ١) آن شخص یا چیز کوتاه؛ ٢) آن حیوان یا شخص تیزگوش و رموك.

**یاقوُت:** ١) ئاقوُت، بەردێکی بەنرخه؛ ٢) کاورای روُتو بێ‌جلك [ف] ١) یاقوت؛ ٢) یاروی لخت و بی‌پوشاك.

**یاقوُتی:** ١) هاورەنگی یاقوُت؛ ٢) جۆرێ ترێی سوُری دەنكورد که زۆر زوُ پێ‌دەگا [ف] ١) همرنگ یاقوت؛ ٢) نوعی انگور. یاقوتی.

**یاقه:** یاخه، پێسیر [ف] یقه.

**یاقیده:** ئاقیده، بیرو بڕوا [ف] عقیده.

**یاقیه:** یاقیده [ف] عقیده.

**یاك:** داك، دایك [ف] مادر.

**یاکرن:** بەقسەکردن: (قەنج کر ب یا **من** کر) [ف] به رأی کسی عمل کردن.

**یاکۆ:** ئەوشتەی که [ف] آنچه، آن چیزکه.

**یاکوُت:** یاقوُت [ف] یاقوت.

**یاکەردەنە:** وەکرن، کردنەوە [ف] بازکردن.

**یاکەریم:** قومری [ف] قمری.

**یاگە:** جێگە [ف] جای، مکان.

**یال:** یاڵ [ف] نگا: یاڵ.

**یاڵ:** ۱) هاڵ، ئاڵە، جنۆکەی زەیستان کوژ؛ ۲) شانی چیا؛ ۳) تۆکی ملی شێرو یەکسم؛ ۴) پۆپەی کەڵەشێر [ف] ۱) آل؛ ۲) ستیغ کوه؛ ۳) یال، موی گردن شیر و اسب؛ ۴) تاج خروس.

**یالانچی:** لەو گونـــدانـــەی کوردستـانـە کە بەعسی کاولیان کرد [ف] روستایی در کردستان کە بعثیان آن را ویران کردند.

**یاڵانچی:** ۱) مرواری دەسکردو ناعەسل، مرواری بەدەڵ ۲) درۆزن [ف] ۱) مروارید بدلی؛ ۲) دروغگو.

**یاڵاوە:** ناوە بۆ دوگوند لە کوردستانی موکوریان [ف] نام دو روستا درکردستان.

**یاڵ تەبەق:** سینی لەدار چێکری [ف] سینی چوبی.

**یاڵ تەبەك:** یاڵ‌تەبەق [ف] سینی چوبی.

**یالخ:** پێچی سەری پیاوان، مێزەر، شاشك [ف] دستار مردانە.

**یالدار:** خاوەن‌پۆپە: (دیکێ **یالدار**) [ف] یالدار، مرغ تاجدار.

**یاڵـلا:** ۱) وتـەیەکـە بۆ دنـەدان: (**یاڵلا** کورگەل بگەنێ)؛ ۲) پێشەنگی دەرکردن: (**یاڵلا** وەدەرکەوە لە ماڵم)؛ ۳) وتەی‌سوپاس: (ها ئەم‌چایە بخـۆ، **یاڵلا**)؛ ۴) وشەی سەیرمان: (**یاڵلا** ئەوە لۆکوێ چوبوی)؛ ۵) وتەی پێش لەبەرهەستان؛ ۶) وتەی بەخێرهێنانو مەرحەبا [ف] ۱) کلمهٔ تشجیع؛ ۲) پیش‌درآمد دَك کردن؛ ۳) کلمهٔ تشکّر؛ ۴) علامت تعجّب؛ ۵) مقـدّمهٔ برخاستـن پیش پای شخصـی؛ ۶) کلمهٔ خیـرمقدم و احوالپرسی.

**یاڵ گەنیگ:** بریتی لە کەچەڵ [ف] کنایە از کچل، کل.

**یاڵـوبژ:** ۱) موُی سەرملی ئەسپو شێر؛ ۲) بریتی لە موُی سەری قرژو تێك‌ئاڵۆزاو [ف] ۱) یالِ حیوان؛ ۲) کنایە از موی ژولیدە.

**یالودوُف:** یاڵو بژ [ف] نگا: یاڵو بژ.

**یالودوُف کرن:** توُکی کلكو یاڵ‌بڕینی ئەسپ [ف] موی دم و یال اسب را کوتاه‌کردن.

**یالە:** کەڵەشاخی جۆشکراو بۆ شەراو تێداخواردنەوە [ف] ساغر مصنوع از شاخ گاو.

**یاڵـە:** ۱) شانو ملەی کێو؛ ۲) ئاڵە، جنۆکەی زەیستان کوژ [ف] ۱) ستیغ کوە؛ ۲) آل، دشمن زائو.

**یام:** ۱) ئان، نا، نام، یا؛ ۲) دام: (پارەکەی تۆ وتت بیدەرێ **یامێ**) [ف] ۱) یا؛ ۲) دادم.

**یامنە:** هی‌منە [ف] مال من است.

**یان:** ۱) ئان، نام، نا، یا؛ ۲) دان؛ ۳) خەبەردان لە نەهاتو؛ ۴) خەبەردەر لە ڕونـەداو: (ئەم کاورایە **یانەیان** دەبێژێ)؛ ۵) تاك لە ناو کۆدا: (ئەویان باشـــە ئەمیان خراوە)؛ ۶) کولاو، تەحت، لبـــاد؛ ۷) پاشگـری کۆ: (**گشتیان**)؛ ۸) قسـەی هەڵـەتو پەڵـەتی دەروێشـانـە؛ ۹) جێگەی ئیسـراحـەتی گشتی؛ ۱۰) بەتـاسـەو تینگی دیدار: (دڵێ من یانـە سێ‌جاری **یانە**) «لاوکی کوردی» [ف] ۱) یا؛ ۲) دادن؛ ۳) غیب‌گویی، پیشگویی؛ ۴) پیشگو؛ ۵) یك درمیان جمع؛ ۶) نمد؛ ۷) پسوند جمع؛ ۸) شطحات درویشان؛ ۹) جای آسودن همگانی، کلوپ؛ ۱۰) مشتاقِ دیدار.

**یانزدە:** یازدە [ف] یازدە.

**یانزدەمین:** یازدەمین [ف] یازدهمین.

**یانزدەهەم:** یازدەهەم [ف] یازدهم.

**یانزدەهەمین:** یازدەهەمین [ف] یازدهمین.

**یانزدهی:** یازدەهەم [ف] یازدهم.

**یانزە:** یازدە [ف] عدد یازدە.

**یانـزەمین:** جاری پاش دەیەم، یازدەمین: (ئـەوە **یانزەمین**‌جارە تەفرەم ئەدەی) [ف] یازدەهمین.

**یانزەهەم:** یازدەهەم [ف] یازدهم.

**یانزەهەمین:** یانزەمین [ف] یازدهمین.

**یانش:** هەڵە، سەهو [ف] سهو، اشتباه.

**یانگزە:** یازدە [ف] عدد یازدە.

**یانگزەمین:** یانزەمین [ف] یازدهمین.

**یانگزەهەمین:** یانزەمین [ف] یازدهمین.

**یانگە:** ۱) جێگەی سانەوە؛ ۲) کێڵگە، موٌچەو مەزرا [ف] ۱) استراحتگاە؛ ۲) کشتزار.

**یانە:** ۱) ماڵ، خانو؛ ۲) جێگەی سانەوە؛ ۳) ئان نا: (وایە **یانە**)؛ ۴) دەنا، نەگینـا؛ ۵) دوڕ ئاپـوٚرە؛ ۶) ئامـرازێکە لە عەڕابەدا [ف] ۱) خانە؛ ۲) باشگاە؛ ۳) یا چنین نیست، یا نە؛ ۴) وگرنە؛ ۵) وسط انبوه جمعیّت؛ ۶) وسیلەای در ارّادە.

**یانەوان:** خاوەن‌ماڵ، بریتی لە باوك [ف] صاحبخانە، کنایە از پدر.

**یانی:** ۱) یانێ، واتا؛ ۲) نهێنی، بەدزیەوە: (سەگەکەیان **یانی**‌گرە ناوەڕێو دەتگرێ)؛ ۳) خانو؛ ۴) جێگەی سانەوە [ف] ۱) یعنی؛ ۲) نهانی؛ ۳) خانە؛ ۴) باشگاە.

**یانێ:** مانای وایە، واتا [ف] یعنی.

**یانیها:** مانای وایە [ف] بەاین معنی.

**یاو:** ۱) تاو لەرز؛ ۲) گەرمای تاو لەرز؛ ۳) ئاو؛ ۴) گەیشتن، هاتنەبەرەوە؛ ۵) یاد، بیرەوەری؛ ۶) ئەسپایی، هێواش؛ ۷) ئەسپ؛ ۸) یەك، نیمەی دو؛ ۹) بەرانبـــەر، وەك یەك [ف] ۱) تب؛ ۲) گرمـای تب؛ ۳) آب؛ ۴) رسیدن؛ ۵) یاد؛ ۶) آهستە؛ ۷) اسب؛ ۸) یك؛ ۹) برابر، مساوی.

**یاوا:** گەیشت، هات [ف] رسید، آمد.

**یاوان:** ۱) بیاوان، بیابان؛ ۲) گەیشتن؛ ۳) ئەوان هاتن [ف] ۱) بیابان؛ ۲) رسیدن، وارد شدن؛ ۳) رسیدند.

**یاوای:** ۱) گەیشتن، هاتنەبەرەوە؛ ۲) تۆ هاتی [ف] ۱) رسیدن، وارد شدن؛ ۲) تو آمدی.

**یاوبڕ:** ۱) کەسێ کە نۆبەتێ بۆ خەڵك دەبڕێ؛ ۲) دەزوی نۆبەتێ‌بڕین [ف] ۱) دعانویس برای قطع تب؛ ۲) نخ تب‌بری.

**یاوبو:** بیرەوەری ف یادبود.

**یاوتا:** لەرزو تا ف تب و لرز.

**یاوتاو:** یاوتا ف تب ولرز.

**یاودی:** جوُ، جوُلەکە، موسایی ف یهودی.

**یاوس:** ئاوس، زگ‌پڕ ف آبستن.

**یاومز:** تیمیسك ف تبخال.

**یاولەرز:** تاو لەرز، لەرزو تا ف تب و لرز.

**یاونای:** ۱) ئاگاکردن، خەبەرپێدان؛ ۲) گەیاندن ف ۱) آگاه کردن؛ ۲) رساندن.

**یاونشان:** یاومز ف تبخال.

**یاوە:** ۱) وڕاوە، وڕێنە، هاتەران؛ ۲) سەبروکە، ئەسپایی ف ۱) هذیان؛ ۲) آهسته.

**یاوەر:** ۱) بریکار؛ ۲) یاریدەر: (خوا یارو یاوەرت بێ) ف ۱) معاون؛ ۲) کمك کننده، یاور.

**یاوەرە:** ۱) منالّدان؛ ۲) ئاوالّمندالّ ف ۱) بچه‌دان، رحم؛ ۲) جفت نوزاد.

**یاوەنان:** گەیاندن، پێ‌گەیاندن ف رسانیدن.

**یاوەیاو:** سەبرەسەبرە، هێدی‌هێدی ف آهسته‌آهسته.

**یاهو:** ۱) جۆرێ کۆتر؛ ۲) وتەی دەم پێ‌فێر بوُگی دەروێشان؛ ۳) فلاّنی لە دواندنا ف ۱) نوعی کبوتر؛ ۲) تکیه‌کلام درویش؛ ۳) آهای فلانی.

**یاهـوّ:** ۱) وشەی سەیرمان؛ ۲) ئەو کارەی، ئەم ئیشەی: (**یاهوّ** کرو دەی نەکر) ف ۱) حرف تعجّب؛ ۲) اینچنین.

**یای:** ۱) وشەی ڕێزگرتن بۆ ژنی بەڕێز، یا: (**یای مروّت**)؛ ۲) بیر، یاد؛ ۳) دوگمەی وەکارخستنی مەکینەو ئەسپاب؛ ۴) دایك؛ ۵) خوشکی دایك، پوُر ف ۱) کلمـه احتـرام زنان، خانم؛ ۲) یاد؛ ۳) دکمهٔ استارت؛ ۴) مادر؛ ۵) خاله.

**یایك:** ۱) دایك؛ ۲) خالتێك، خوشکی دایك، پوُر ف ۱) مادر؛ ۲) خاله.

**یایك‌زا:** ڕۆلّەی خوشکی دایك، پوُرزای دایکی ف خاله‌زاده.

**یایکێ:** بانگ‌کردن لە پوُر، خوشکی دایك بانگ‌کردن، خالتێکا من ف ای خاله.

**یایە:** ۱) خانمی بەڕێز؛ ۲) دایە، دایك: (گەر من دروّدە کـەم ئەوە دایکت بپرسە لێی / **یایە** بە دەستی خوّی کەفەن‌و دەفنی کردوە) «شێخ ڕەزا» ف ۱) خانم، ۲) مادر.

**یایی:** بەدوگمە بوّ وەکارخستن ف دارای دکمهٔ استارت.

**یاییّ:** یایکێ ف ای خاله.

**یچ:** پیتی بادانەوە: (**ئەمیچ، منیچ**) ف حرف عطف، پسوند به معنی نیز.

**یچە:** پاشگری بادانەوە: (**ئەمیچە، ئەویچە**) ف پسوند عَطف.

**یخ:** ۱) وتـەی ئاژوّتنی بزن؛ ۲) وتەی بەسەر چوّکا هێنانی وشتر ف ۱) حرف راندن بز؛ ۲) حرف خوابانیدن شتر.

**یخخە:** وتەی ئاژوّتنی بزن، ئیخە، وتەی وەدەرنانی بزن ف حرف راندن بز.

**یخ‌دان:** بەسەر چوّکا هێنانی وشتر ف خوابانیدن شتر.

**یژگە:** وتەی چوُك‌نیشاندان: (**کوڕێژگە**) ف حرف تصغیر.

**یشتـە:** گونـدێکـە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**یل:** عێل‌و عاشیرەت ف ایل، طایفه.

**ین:** ۱) وەك، لەجـــوّر: (**ئـــاسـنین، زێڕین، زیوین**)؛ ۲) کردن: (**گرین، پچڕین، وەڕین**) ف ۱) مانند، از نوع؛ ۲) انجام دادن، علامت مصدری.

**ێن:** ۱)دروسکراوله: (**نیسکێن**)؛ ۲) نا، نە: (**خورێن** واتا: هیچ‌نەخواردو)؛ ۳) پاشگـــری کارکـــەر: (**هـەلّکـرێن، دڕێن**)؛ ۴) وازی: (**تـوّپێن، توّپەڕاکردێن، گلێن**) ف ۱) پسوند به معنی ساخته شده از؛ ۲) نه؛ ۳) پسوند فاعلی؛ ۴) بازی.

**ینە:** لەڕەنگی، وەکو: (**پەلکەزێڕینە، سەرئاسنینە**) ف مانند.

**یوّ:** ۱) یەك؛ ۲) ئەو ف ۱) یك؛ ۲) او.

**یوُ:** یوّ ف نگا: یوّ.

**یوّبینوُ:** یەکتری، یەوبینان ف یکدیگر.

**یوّبینوُموەژنایش:** یەکتر چاوپێکەوتن ف یکدیگر را دیدن.

**یوّخروّکە:** مەگین‌نە؟ ف مگرنه؟

**یوّخلەمە:** لەدوگەڕان، بوّگەڕان ف بەدنبال گشتن.

**یوّخە:** یەوخە، ناسکەنان، نانی‌تەنك ف نان نازك.

**یورت:** جێ‌لەوەڕ، چایەر ف چراگاه.

**یوّرت:** قالب، بەدەن ف کالبد.

**یوّرش:** شالاّو، هێرش، پەلامار ف یورش.

**یوّرغە:** وێرغە، جوّرێ ڕەوتی یەکسم ف یورغه.

**یوّز:** هاس، تولّەپلّنگ ف یوزپلنگ.

**یوژنە:** قایشی جوُت ف تسمهٔ رابط یوغ و خیش.

**یوّژە:** یوژنە ف نگا: یوژنه.

**یوسر:** ویسر، بەری دارێکە ڕەنگی ڕەشە دەسحێبی لێ چێ‌دکن ف دانهٔ تسبیحی، یسر.

**یوسفاغا:** گوندێکە لە کوردستان ف نام روستایی است.

**یوك:** دوّلاّبی ف کمد.

**یوکاجللان:** دوّلاّبی جلکان ف کمد بزرگ لباس.

**یوم:** ودم، مبارەکی، یومن ف یُمن.

**یوّم:** ۱) ئوّغر، ودم، ممبارەکی؛ ۲) ڕێگە، مزلّێ کە بوّی دەچی: (**یوّمی تە بخێر**) ف ۱) یُمن، مبارکی؛ ۲) مقصد سفر.

**یومن:** ودم، ممبارەکی ف شگون.

**یوّمە:** ڕوّژانە، کرای ڕوّژانە ف یومیه، جیرهٔ روزانه.

**یوّنا:** یەکتر، یەك‌و دو، یەونا ف یکدیگر.

**یوّنجە:** وێنجە ف یونجه.

**یوە:** ئێکێك ف یکی.

**یوهـ کەردش:** هوهاکردن، بمرێ، بکەوێ ف مرده‌باد.

**یە:** ۱) ئەمە؛ ۲) ئێك؛ ۳) پاشگری خەبەردان، ئەی: (**وایە، چویە، بویە**) ف ۱) این؛ ۲) یك؛ ۳) پسوند خبری.

**یەباش:** هێواش، هێدیکا، لەسەرخوّ، ئەسپایی ف یواش.

**یەباشکی:** بە لەسەرخۆیی، بە ئەسپایی ف یواشکی، بەآهستگی.

**یەپارچە:** ئێك‌پاژ ف یکپارچە.

**یەپراخ:** ئاپراخ، یاپراخ ف نگا: یاپراخ.

**یەتا:** ئەمەتا، ئائەمەیە ف همین است.

**یەتاخ:** یاتاخ، پێخەف، نقین، نوێن ف رختخواب.

**یەتیم:** هەتیو ف یتیم.

**یەتیمچـە:** ۱) هەتیمچە؛ ۲) چێشتێکی باینجانە ف ۱) ناکس بچە؛ ۲) یتیمچە، نوعی خورش.

**یەتیمچەرك:** هەتیمچە ف ناکس بچە.

**یەجگار:** زۆر ف بسیار.

**یەچك:** هێچك ف وهنگ.

**یەح:** وتەی سەیرمان ف حرف تعجّب.

**یەحیا:** ناوە بۆ پیاوان ف نام مردانە.

**یەحیابەگی:** جۆرێ هەنجیر ف نوعی انجیر.

**یەح گدۆ:** وشەی دنەدانی بزن بۆ دوُرکەوتن ف کلمۀ راندن بز.

**یەحیەح:** وشەی هانەی بزن بۆ زوُ بەرێداچوُن ف کلمۀ راندن بز.

**یەخ:** سەهۆڵ، جەمەد، سۆڵ ف یخ.

**یەخاو:** سەهۆڵاو ف یخاب.

**یەخبەنان:** بەستەڵەك ف یخبندان.

**یەخبەند:** سەهۆڵ‌بەستو ف یخ بستە.

**یەخبەندان:** یەخ‌بەنان، بەستەڵەك ف یخبندان.

**یەختــرمــە:** ۱) ئەســپ‌و ماینــی تالانی؛ ۲) یەدەکی، ئەسپێ کە بۆ نۆرەپێ‌کردن دەگەڵ سواردایە؛ ۳) ئەسپی زین‌و لغاوکراوی بێ‌سوار کە لە ئازیەت‌باریدا ڕای‌دەکێشن ف ۱) اسب غنیمتی؛ ۲) اسب یدك؛ ۳) اسب بدون سوار در مراسم عزاداری.

**یەختە:** ۱) ئێختە، گون‌دەرهاتگ؛ ۲) داری سەرقرتاو؛ ۳) ئەسپ‌و ماینی سواری ف ۱) اختە؛ ۲) درخت سر قیچی شدە؛ ۳) اسبِ سواری.

**یەختەخانە:** تەویلەی ئەسپان ف اصطبل اسبان.

**یەختەرخانە:** یەختەخانە ف اصطبل اسبان.

**یەختەرمە:** یەخترمە ف نگا: یەخترمە.

**یەختەسار:** ئاهۆ، ئازار ف وبا و آفات.

**یەخدان:** ۱) سندوُقی دارینی زەلام؛ ۲) قوتولکەی ڕۆن ف ۱) صندوق چوبی بزرگ؛ ۲) روغن‌دان کوچك.

**یەخدو: سندوُقی زل، یەخدان نگا: یەخدان.**

**یەخسیر:** ۱) دیل، گراو لە شەڕدا؛ ۲) بێچارە، بەستەزمان ف ۱) اسیر؛ ۲) بینوا، بیچارە.

**یەخش:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان کە بعثیان آن را ویران کردند.

**یەخ کردن:** کەسیرەبوُن لەسەرمان ف یخ کردن.

**یەخنی:** ۱) تاسی قوُڵ بۆ شێوتێکردن؛ ۲) چێشتی گوشتاو ف ۱) نوعی کاسۀ آشخوری؛ ۲) یخنی، آبگوشت.

**یەخنی کێش:** تاسی مسینی گەورە ف کاسۀ بزرگ مسین.

**یەخە:** یاخە، پێسیر ف یقە.

**یەخـەچـاڵ:** ۱) چاڵـەبـەفر؛ ۲) سەهۆڵدان ف ۱) چالە برف، یخچال طبیعی ۲) یخچال.

**یەخەدادڕاو:** جۆرێ گەنم ف نوعی گندم.

**یەخــەدادڕین:** برێتی لە خوڵێ بێ‌بەش کردن: (**یەخـەم لێ دادڕیوەو** نامەوێ) ف کنایە از تنفّر و انزجار.

**یەخەدڕ:** دەمی کەرێز ف دهانۀ کهریز.

**یەخەکێشیاگ:** برێتی لە کەسێ کە پیاو بە فرزەندی قبوُڵی دەکا ف فرزندخواندە.

**یەخەگرتن:** برێتی لە کێشەتێ‌هاڵاندن ف گریبانگیری.

**یەخی‌مالێ:** گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدۀ کردستان توسط بعثیان.

**یەدەك:** ۱) ئەسپی یەختەرمە، ئەسپی بەزین کە لەدوای‌سوار دەڕوا؛ ۲) ئامـرازی زیادی بۆجێگـرتنەوەی خراوبوُگ ف ۱) اسب یدکی؛ ۲) ابزار یدکی.

**یەدەکی:** یەدەك ف نگا: یەدەك.

**یەر:** ۱) جێگـە، جێ؛ ۲) ئێـوار، ئێوارە، یـەرە ف ۱) جا، مکان؛ ۲) عصرهنگام.

**یەربەیەر:** جێ‌بەجێ، پێك‌هاتن، ئەنجام ف انجام یافتن.

**یەربەیەربوُن:** جێ‌بەجێ‌بوُن: (کارەکە یەربەیەر بو) ف انجام شدن.

**یەرتکی:** شێتۆکە، کەم‌ئاوەز ف کم‌عقل، خُل مزاج.

**یەرخات:** پاڵـە، کرێکـار، ڕەنجبەر، ڕەنجدەر، خەباتکـار، خەباتچی ف کارگر.

**یەرد:** یارد، گەزی پێوانەی ئینگلیس ف یارد.

**یەردە:** هاڕین، کردنەئارد ف آردکردن.

**یەرکەن:** بادەوەی گەمیە ف بادبان کشتی.

**یەرمـە:** لوڕ، کورتانۆکەی بەپوُش ئاخندراو بۆ سەرپشتی بارەبەر لەبن جلەوە ف پالانك بالشتك مانند.

**یەرووەیەر:** ۱) یەربەیەر؛ ۲) بەرانبەر ف ۱) انجام شدن؛ ۲) برابر.

**یەرە:** ۱) ژمارە سێ؛ ۲) ئێوارە ف ۱) عدد سە؛ ۲) عصرهنگام.

**یەرەژن:** ۱) ئەژنۆ، زرانی؛ ۲) ئانیشك، هەنیشك ف ۱) زانو؛ ۲) آرنج.

**یەرەق:** ۱) تۆپی ئاش؛ ۲) ئاموُر، ئەسپابی جوُت؛ ۳) کێری یەکسم؛ ۴) هەستـانی کێر؛ ۵) کێری ڕەپ ف ۱) پروانۀ آسیاب؛ ۲) خیش؛ ۳) آلت تنـاسلی ستـور و الاغ؛ ۴) برخـاستن آلت تنـاسلی؛ ۵) آلت تناسلی برخاستە.

**یەرەقان:** زەردوُیی ف بیماری یرقان.

**یەرەقبوُن:** ڕەپ‌بوُنی کێر ف برخاستن آلت تناسلی.

**یەرەق کردن:** ئێرەق‌کردن ف راست کردن آلت تناسلی.

**یەرەقە:** هەوجاڕ، ئاموُر ف خیش.

**یەرەووتەنگ:** تەنگی ئێوارە، تەنگی بانگی شێوان ف تنگ غروب.

**یەرەی:** ئێوارە، ئێوارەوەختە ف عصرهنگام.

**یەرێ:** سێ‌تاك ف سەعدد.

**یەزدان:** خودا، ئێزد، خودێ، بینــایی‌چاوان، هۆمــان، خوا، خودانــی عالەمێ، باخوێ ف خدا.
**یەزدانی:** خودایی ف خدایی، یزدانی.
**یەزدۆ:** خواپەرست ف خداپرست.
**یەزدی:** پەیڕەوانی ڕەوشتی یەزیدی، ئێزدی ف پیر و آیین ایزدی.
**یەزدین:** سوکەناوی عیززەددین، ناوە بۆ پیاوان ف مخفّف عزّالدّین، نام مردانە.
**یەزنە:** مێردی خوشك ف شوهرخواهر.
**یەزەن:** زاوا، شوی کچ یان خویشك ف داماد.
**یەزی:** بەس، بەسە ف کافی، بس.
**یەزیدی:** ئێزدی، کۆمەڵی مەلەك تاوس پەرست، یەزدی ف پیر و مذهب ایزدی.
**یەسك:** پیشە، هەستو، هەستی، ئێسقان، ئێسك ف استخوان.
**یەسیر:** یەخسیر، دیل ف اسیر.
**یەش:** ئێش، ئازار: (هەمو لەشم یەشێ) ف آزار، درد.
**یەشان:** ئێشان، ژان کردن ف بەدرد آمدن.
**یەشم:** شەوە، بەردێکی بەنرخە ف یشم، سنگی است قیمتی.
**یەشماخ:** یاشماخ ف دستار مردانە.
**یەع:** وتەی بێزکردن، قێز لێ بونەوە: (**یەع** چەند پیسە) ف حرف تنفّر از کثافت.
**یەعنی:** یانی، واتا، یانیها ف یعنی.
**یەغان:** یەخدان ف صندوق بزرگ چوبی.
**یەغدان:** یەخدان ف صندوق بزرگ چوبی.
**یەغــز:** ڕەنــگێکــە بۆ وڵاغــی سواری‌و باری ف یکی از رنگهــای استرسواری و باری.
**یەغگدۆ:** ییخە، وتەی بزن‌دەرکردن ف کلمۀ راندن بز.
**یەغنی:** ١) یەخنی؛ ٢) گیشەی گیا یان گەنم‌و جۆ ف ١) نگا: یەخنی؛ ٢) تودۀ علوفە یا گندم و جو درو شدە.
**یەغنی کێش:** یەخنی کێش ف نگا: یەخنی کێش.
**یەغیەغ:** دنەدانی بزن بۆ خۆشڕۆیی ف کلمۀ راندن بز.
**یەفش:** وچان لە کار ف تعطیل.
**یەق:** ١) قرپ، قورپ؛ ٢) گەڕانــەوەی تراو لە جێگــەی خۆی: (**یەقی** کردەوە)؛ ٣) ڕشانەوە ف ١) آروغ؛ ٢) برگشت آب راکد؛ ٣) قی، بالاآوردن.
**یــەق‌خــواردنــەوە:** گەڕانــەوەی ئــاوی ڕاوەستــاو: (ئــاوە کــە **یەقی‌خواردۆتەوە** لەبەری نازوا) ف راکدماندن و برگشتن آب.
**یەق‌دانەوە:** یەق‌خواردنەوە ف راکد ماندن و برگشتن آب.
**یەق‌کردنــەوە:** ١) وەڕشــان، ڕشــانەوە، هێنانەوە؛ ٢) نم‌کێشانی خوێ‌و شەکر ف ١) قی کردن؛ ٢) نم کشیدن نمك و شکر.
**یەقە:** یاخە ف یقە.
**یەقین:** دیار، ڕاست، بێ‌درۆ، بێ‌گومان ف یقین.
**یەك:** ١) ئێك، یو، لە ژمــارەداســەرەتــا؛ ٢) بێ‌فەرق‌و جودایی: (منو تۆ **یەكین**، ئەگەر ئێمــە **یەك** بین کەس پێمان ناوەستێ)؛ ٣) بونەئاڵقە: (خواری کردەوەو سەری گەیاندەوە **یەك**) ف ١) عدد یك؛ ٢) وحدت؛ ٣) حلقە شدن.
**یەکا:** هەوەڵین، یەکەمین ف اوّلین.
**یەکادان:** تێکەڵاوکردن ف بهم زدن.
**یەکاڵا:** ڕەهایی تاڵی ئاڵۆزو تێکەڵاو: (ئەم بەنە ئاڵۆزاوە **یەکاڵا** نابێ) ف یك لایەشدن چندلایە.
**یەکــاڵابــونــەوە:** ئاڵۆزاوی تێکەڵ‌پێکەڵ بون بە یەك‌لایەو لە ئاڵۆزی ڕەهابون: (ئەم کارە دشوارو تێکەڵە **یەکاڵا بۆوە** یان نا؟) ف بازشدن و یك لایەشدن چندلایە و درهم برهم.
**یەکاڵاکردن:** یەك‌لایەکردنەوەی تێکەڵاو ف یك لایەکردن.
**یەکاڵاکردنەوە:** یەکاڵاکردن ف یك لایە کردن.
**یەکاڵە:** یەکاڵا ف نگا: یەکاڵا.
**یەکان:** تاکان، دانەدانەکان ف آحاد، یکان.
**یەکانە:** ١) بڕەك، بڕەك، نێرەبەراز؛ ٢) تاقانە، بێ‌هاوتا ف ١) گرازنر؛ ٢) بی‌همتا.
**یەکانی:** تەنیایی ف تنهایی.
**یەکاوە:** قوبڵی ف دمپخت.
**یەکــاویەك:** ١) دەس‌بەجێ: (دوعــای خەلیفــە **یەکــاویەکە**)؛ ٢) دوئەوەندە: (ماڵەکە **یەکاویەك** قازانجی‌کرد) ف ١) فوری؛ ٢) دوچندان.
**یەکپا:** تاکێ بوایە ف یك می‌بود.
**یەکبــاد:** ١) بەنی تاکــەجــارێك بادراو؛ ٢) برێتی لە گیانــداری لاوازو باریك‌و بێ‌تین ف ١) نخ یکباد، یکتاب؛ ٢) کنایە از لاغر و ناتوان.
**یەکباز:** گەمەیەکی بازبردنە ف نوعی بازی پرش.
**یەکباڵ:** برێتی لە مرۆی تەنیاو بێ‌یاریدەر ف کنایە از تنها و بی‌یارویاور در کار.
**یەك‌بتون:** گش، گشت، هەمو ف همگی.
**یەکبڕ:** جاش‌و جانوی دوساڵە ف کرۀ دوسالە.
**یەکبون:** ڕێکی‌و دۆستایەتی ف اتّفاق، اتّحاد.
**یەکبوین:** یەکبون، یەك‌گرتن، پشتی یەك گرتن ف اتّحاد، اتّفاق.
**یەکبویی:** یەکیەتی، یەکبون ف اتّحاد.
**یەکبەر:** ١) قوماشێ کە لەسەر یەك‌قەد قەدکراوە؛ ٢) ئاژەڵ‌و دارێك کە بۆ یەکەم‌جار زاوەو بەری بەخشیوە ف ١) یك لایە؛ ٢) دام یا درختی کە برای اوّلین بار ثمر دهد.
**یەك‌بەیەك:** تاك‌بەتاك، هەمو ف یك بەیك، همە.
**یەکبێژ:** ١) بەعوزم‌و گرانی؛ ٢) دور لە گەمەو درۆو دەلەسەکردن ف ١) باوقار؛ ٢) جدّی.
**یەکبین:** ١) لە یەك هەناسەکێشاندا: (**یەکبین خواردیەوە**)؛ ٢) یەکبون ف ١) یك نَفَس، در یك نفس کاری کردن؛ ٢) اتّحاد، اتّفاق.
**یەکبیەك:** یەك‌بەیەك ف یك بەیك.
**یەکپــا:** ١) برێتی لە سەرســەختی، لاساری، سوربون: (**یەکپا** وێستاوە

هەر دەیەوێ)؛ ۲) گیانداری کوت، ئەوی قاچێکی لەدەست‌داوە ف ۱) کنایه از پافشاری؛ ۲) یکپا، جانداریکه یك پای خود را از دست داده است.

**یەك‌پارچە:** ۱) لەت‌نەکراو؛ ۲) پارچەیەك لە شت ف ۱) یکپارچه، کامل و تقسیم نشده؛ ۲) بخشی از چیزی.

**یەکپارە:** ۱) یەکپارچە؛ ۲) تاکە قۆشەیەك: (من کە **یەك‌پارەیی** جلقم لە ئەزوڵ شك‌نەدەبرد) ف ۱) نگا: یەکپارچە؛ ۲) یك پول.

**یەك‌پەرست:** خودای تاك‌و تەنیاناس ف موحّد، یکتاپرست.

**یەك‌پەرستی:** کاری یەك‌پەرست، خودای تاك ناسین ف توحید، یکتاپرستی.

**یەکتـــا:** ۱) تەنیای بێ‌وێنـە؛ ۲) ناوی خوایە؛ ۳) ناوە بۆ پیاوان ف ۱) تنهای بی‌مانند؛ ۲) نام خدا؛ ۳) نام مردانه.

**یەکتاپەرست:** یەك‌پەرست ف یکتاپرست.

**یەکتاپەرستی:** یەك‌پەرستی ف یکتاپرستی.

**یەکتـر:** ۱) هەودو، ئێکتر: (لەگەڵ **یەکتر** بوون)؛ ۲) یەکی دیکە: (**یەك‌تر بیرە**) ف ۱) یکدیگر؛ ۲) دیگری.

**یەکتری:** یەکتر، ئێکتر ف یکدیگر.

**یەکترین:** یەکتر، ئێکتر ف یکدیگر.

**یەك‌توخم:** وەك یەك، چون یەك ف همانند، همنوع.

**یەکتـەن:** ۱) تەنیابـاڵ، یەکباڵ؛ ۲) لە پرێکا، ژ نشکاف ف ۱) تنهای بی‌یارویاور؛ ۲) ناگهان، یکهو.

**یەکتەنی:** تەنیابالّی ف تنهایی بدون یاور.

**یەکجار:** ۱) تەنیا جارێك؛ ۲) زۆر زۆر، یەجگار؛ ۳) هەرگیز، بە هیچ ئارا: (ئـەز **یەکجار** قەبول ناکەم)؛ ۴) مردنی بە سەکتە، کوتوپڕ: (**یەکجار مر**) ف ۱) یکبار، یك دفعه؛ ۲) بسیار؛ ۳) هرگز، بەهیچوجه؛ ۴) مرگ ناگهانی، مرگ مفاجا.

**یەکجارە:** بەتەواوی ف یکسره.

**یەکجارەکی:** بەتەواوی، بێ کەم‌وکوڕی ف یکسره، بەکلّی.

**یەکجاری:** ئاخرجار ف آخرین بار.

**یەکجۆر:** یەك‌توخم ف یکنواخت، یك نوع.

**یەکجۆر:** یەکجۆر ف یك نوع، یك جور.

**یەکجێ:** بەتەواوی: (**یەکجێ بردی و ڕۆیشت**) ف بەکلّی، کاملاً.

**یەکچاقە:** جانەوەری بە**تاقەچاوێك**) ف یك چشم.

**یەکچاقی:** ژیان بە چاوێك ف **یك چشمی، یك چشم داشتن.**

**یەکچـاو:** ۱) جانـەوەرێ کە چاوێکی هەیە؛ ۲) یەکالا؛ ۳) لە دژواری و ئالۆزی ڕزگاربوگ: (**یەکچاو** بوینەوە، کارەکەمان **یەکچاوکردەوە**) ف ۱) یك چشم؛ ۲) یك لایەشدن؛ ۳) حلّ و فصل مشکلات.

**یەك‌چاوە:** ۱) تاقـەئـۆدەیەك لەماڵدا؛ ۲) کاورای کوێر لە چاوێك ف ۱) یکباب خانه؛ ۲) یك چشم.

**یەك‌چاوەیی:** خانوێ کە هەموی هەر یەك‌ژوری تیایە ف خانهٔ یك اتاقه.

**یەك‌چەشن:** یەکجۆر ف یك نوع.

**یەك‌خستن:** ۱) کـردنەیەك؛ ۲) لێك کردنـەدژ ف ۱) متّحـدکردن؛ ۲) دوبەهم‌زنی.

**یەکدان:** ۱) تۆمی پاکژو بێ‌عەیب؛ ۲) تێکەڵ‌کردن ف ۱) بذر پاك وسره؛ ۲) بهم‌زدن.

**یەکدڵ:** دۆستی ڕاست ف دوست یك دل.

**یەکـدەس:** ۱) گیانـداری کە دەسـتێکی هەیە: (ئێژی ڕۆستـەمی **یەکدەسە**)؛ ۲) یەکجۆر ف ۱) یك دست؛ ۲) یك نوع.

**یەکدەست:** یەکدەس ف نگا: یەکدەس.

**یەکدەستە:** ۱) کۆمەڵێك پێکەوە؛ ۲) بێ‌پیل، یەکدەست ف ۱) دسته‌ای، یك دسته؛ ۲) جاندار یك دست.

**یەکدەستی:** تفاق، یەکیەتی ف اتّحاد، اتّفاق.

**یەکدەنگ:** هاوهزر، هاوبیر ف همفکر.

**یەکدەنگی:** بێ‌بەرهەڵست، بێ‌نارازی ف اجماع آراء، اتّفاق آراء.

**یەکڕا:** هاوبیر، هاوباوەڕ ف همفکر، هم‌عقیده.

**یەکڕان:** ۱) ئەسپی خۆشڕۆ، خۆشبەز؛ ۲) گیانداریێ لاڕانێکی نەمابێ ف ۱) اسب رهوار؛ ۲) جانداری که یك ران خود را از دست داده.

**یەکـڕو:** ۱) بێ‌ڕیا، ڕاست‌و ڕەوان، بێ‌درۆو دوڕوویی؛ ۲) جلك‌و کوتـاڵی بەروپشت یەکرەنگ ف ۱) روراست، یك‌رنگ؛ ۲) پارچه‌ای که پشت و روی یکرنگ دارد.

**یەکڕۆژە:** لە ماوەی تاکەڕۆژێکدا ف یك روزه.

**یەکڕۆژی:** ئەوەی بۆ ڕۆژێك بەش‌دەکا ف مصرف یك روز.

**یەکڕوە:** نیمرۆ، هێرۆن، خاڕون ف نیمرو.

**یەکـڕوویی:** ۱) دژی دوڕوویی، ڕاست‌و دروستی؛ ۲) نرخێ کە ناگۆڕێ‌و چەقیوە ف ۱) صداقت؛ ۲) نرخ ثابت.

**یەکڕەنگ:** ۱) هاوڕەنگ؛ ۲) بریتی لە مرۆی ڕاست‌و بێ‌گزی‌و گەڕ ف ۱) همرنگ؛ ۲) کنایه از آدم صادق و بی‌غلّ و غش.

**یەکـڕەنگی:** ۱) لەڕەنگـا وەك یەك؛ ۲) هەر بە ڕەنگێك؛ ۳) ڕاستی‌و دروستی ف ۱) همـرنگی؛ ۲) بایك رنـگ، دارای یك رنـگ؛ ۳) یك‌رنگی، صداقت.

**یەکزمان:** ئەوانەی هەموو یان بە زمانێ داخێون ف هم‌زبان.

**یەکزەمان:** ڕۆژگارێك ف زمانی، روزگاری.

**یەکژنە:** بەرانبەر بە دوژنە، کەسێ هەر تاکەژنێکی هەیە ف مرد یك زنه.

**یەکژنی:** یەکژنە ف مرد یك زنه، دارای یك همسر.

**یەکسان:** بەرانبەر ف یکسان.

**یەکسم:** بریتی لە ئەسپ‌و ئێستر ف کنایه از اسب و استر.

**یەکسەر:** ڕاست بێ ئاوڕدانەوە ف یکراست.

**یەکسەرە:** ۱) بە یەکجاری بڕانەوە: (کارەکەمان **یەکسەرە** کردەوە)؛ ۲) یەکسەر ف ۱) یکسره؛ ۲) یکراست.

**یەکسەرەکی:** یەکجارەکی ف یکبارکی.

**یەکســەری:** ۱) ڕەشکـەی یەکتایی کاکێشان؛ ۲) ناوماڵی زۆر گەورەو لەدرێژەوە؛ ۳) ڕایەخی پڕ بە ژووری گەورە ف ۱) تور کاهکشی بزرگ یکتایی؛ ۲) سالن بزرگ خانه؛ ۳) فرش دراز پُر سالن.

**یەکشــقــە:** ۱) هەیقـك، مانگیلە؛ ۲) تەنیای بێ‌نیاز ف ۱) هلال؛ ۲)

تنهای بی‌نیاز.

**یەکشەق:** ۱) یەکپارچە؛ ۲) یەکسەر، راست بێ‌بادانەوە ف ۱) یکپارچه؛ ۲) یکراست.

**یەکشەم:** رۆژی دوهەم دوای هەینی ف یکشنبه.

**یەکشەمبی:** یەکشەم ف یکشنبه.

**یەکشەممو:** یەکشەم ف یکشنبه.

**یەکشەممۆ:** یەکشەم ف یکشنبه.

**یەکشەممە:** یەکشەم ف یکشنبه.

**یەکشەمو:** یەکشەم ف یکشنبه.

**یەکشەمۆ:** یەکشەم ف یکشنبه.

**یەکشەمە:** یەکشەم ف یکشنبه.

**یەکشەمی:** یەکشەم ف یکشنبه.

**یەکشەو:** تاکەشەوێك ف شبی.

**یەکشەوە:** ۱) هەوڵ‌بەفری زستان؛ ۲) مانگیلە، هەیڤك؛ ۳) ناوی گوندێکە؛ ۴) هەر لە ماوەی تاکەشەوێکدا ف ۱) اوّلین برف زمستان؛ ۲) هلال؛ ۳) نام دهی است؛ ۴) یکشبه.

**یەکقسە:** ۱) هاوپەیمان؛ ۲) بەڵێن‌ڕاست ف ۱) هم‌پیمان؛ ۲) قول درست.

**یەك‌کرن:** ۱) کردنەیەك؛ ۲) پێك‌هێنانی تاپۆرە لەسەر کارێ ف ۱) یکی کردن؛ ۲) به‌توافق رساندن گروهی.

**یەك‌کری:** ۱) کردراوبەیەك؛ ۲) یەك‌گرتوویی ف ۱) یکی شده؛ ۲) اتّحاد.

**یەك‌کەتن:** ۱) رێك‌کەوتن؛ ۲) وێك‌کەوتن ف ۱) اتّحاد؛ ۲) برخورد.

**یەك‌کەرەت:** ۱) یەکجار؛ ۲) لەپڕ، ژنشکاف ف ۱) یکبار؛ ۲) یکهو.

**یەك‌کەفتن:** یەك‌کەتن ف نگا: یەك‌کەتن.

**یەك‌کەوتن:** یەك‌کەتن ف نگا: یەك‌کەتن.

**یەك‌گاسنە:** شێوەردی یەکجار کێڵدراو ف یکبار شخم شده.

**یەك‌گرتن:** ۱) یەکبوون؛ ۲) پێوەنووسان: (بەو چرێشەوا **یەك‌گرتووبوون**) ف ۱) اتّحاد؛ ۲) بهم چسبیدن.

**یەك‌گرتو:** یەك‌کری، پێکەوە هاوخەبات ف متّحد، هم‌پیمان.

**یەك‌گرتوویی:** تفاق، هاوڕای و هزر بوون ف اتّحاد، اتّفاق.

**یەك‌گرتی:** یەك‌گرتو ف متّحد.

**یەکلا:** ۱) لایەك، لایەنێك؛ ۲) تاکەلۆیەك ف ۱) یك طرف؛ ۲) یك لایه.

**یەك‌لانە:** یەکالا ف نگا: یەکالا.

**یەك‌لایی:** بێ قەدکردن: (بە دولایی ناگاتەوە بە **یەك‌لایی** باشە) ف یك لایه.

**یەك‌لسەریەك:** ۱) بەسەریەکا هەڵچنراو؛ ۲) بێ ماوەدان و دەرفەت: (**یەك‌لسەریەك** داخاوت) ف ۱) بر رویه هم انباشته؛ ۲) پشت سر هم و بدون تأمّل.

**یەك‌لنگە:** گیایەکە ف گیاهی است.

**یەکلۆ:** یەك‌لا ف نگا: یەك‌لا.

**یەك‌لۆنە:** یەك‌لایی ف یك لایه.

**یەکلە:** یەکتەن، تەنیابال ف تنها و بی‌یاور.

**یەکڵەچاو:** یەکچاو ف یك چشم.

**یەك‌لەدوای‌یەك:** گش پێکەوەنا ف یکی پس از دیگری.

**یەکماڵ:** ۱) دۆستی گیانی؛ ۲) دارایی بەش‌نەکراو ف ۱) دوست واقعی؛ ۲) دارایی شراکتی و تقسیم نشده.

**یەکمالاگارە:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**یەکمالە:** گوندێکە لە کوردستانە بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**یەکمان:** ۱) سەرۆك، سەرداری گەڵ؛ ۲) سەرکۆمار ف ۱) رئیس، سردسته؛ ۲) رئیس جمهور.

**یەکنەجار:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**یەك‌نەسەق:** یەکجۆر ف یکنوع.

**یەکو:** یەکتان ف یکی از شما.

**یەکۆبسەدیو:** یەکێ بە سەتان ف یکی در برابر صد.

**یەکودن:** یەکی‌تر ف یکی دیگر.

**یەکودو:** بریتی لە دەس‌بەجێ ف بی‌درنگ.

**یەکون:** کۆمەڵ، بەتۆپەڵ، کۆم، کۆ ف جمع.

**یەکۆیەکۆ:** یەکی‌یەکی، هەمو تاکیکی ف یکی یکی.

**یەکە:** ۱) بێ‌وێنە؛ ۲) یەك، تاك لە ژماردندا: (**یەکە** دوە سێ‌یە) ف ۱) بی‌مانند؛ ۲) آن یك.

**یەکهاوی:** لە یەك‌باری ژیاندا، بێ‌گۆڕان ف گذران بدون تغییر، یکنواخت.

**یەکەتی:** رێك‌کەوتن و یەکبوون ف اتّحاد.

**یەکەڵ گون:** بەتاکەگونێك ف یك خایه.

**یەکەڵ گوان:** بەتاکەگوانێك ف یك پستانه.

**یەکەڵەچن:** نەمان یەك لەشوێن‌یەك ف ازبین رفتن یکی پس از دیگری.

**یەکەڵەشاخ:** بەتەنیاشاخێك ف حیوان یك شاخ.

**یەکەم:** هەوەڵ ف نخست.

**یەکەمجار:** ۱) دەحفەی هەوەڵ؛ ۲) هەر لەجێ ف ۱) بار اوّل؛ ۲) فوراً.

**یەکەمین:** هەوەڵین، یەکا ف نخستین.

**یەکەناس:** چارەوێ کە ڕێگەی نامۆ نادا سواری‌بن ف اسبی که اجازه سواری به بیگانه نمی‌دهد.

**یەکەندەردو:** هەر دەس‌بەجێ، یەکودو ف فوراً.

**یەك‌هۆ:** لەپڕ، ژ نشکاف ف یکهو، ناگهانی.

**یەکەوجار:** ۱) هەر بۆ جاری یەکەم؛ ۲) دەست‌بەجێ ف ۱) بار اوّل؛ ۲) فوراً.

**یەکەوحەیزەران:** جۆرێ گەمەی شەوانەیە ف نوعی بازی.

**یەکەوڕاست:** یەکسەر ف یکراست.

**یەکەوکڵاوە:** جۆرێ بازی‌یە، گەمەیەکە ف نوعی بازی.

**یەکەوگۆتەکە:** جۆرێ گەمە ف نوعی بازی.

**یەکەونیان:** ١) کۆکردنەوە؛ ٢) لەسەریەك دانان ف ١) گردآوری کردن؛ ٢) برهم گذاشتن.

**یەكهێشە:** یەك گاسنە ف زمین یکبار شخم‌زده.

**یەکەیەکە:** تاکەتاکە ف یکی یکی.

**یەکیتە:** ١) پیتی دەنگدار لە ئەلف‌وبێتکەدا؛ ٢) وتەیەکە لە بەشکردندا: (**یەکیتە** یەکی من) ف ١) حرف صدادار؛ ٢) **اصطلاحی در تقسیم.**

**یەکیتی:** یەکایەتی، بێ‌جیاوازی ف اتّحاد.

**یەکێتی:** یەکایەتی، بێ‌جیاوازی، یەکیتی ف اتّحاد.

**یەکینی:** یەکایەتی، ژیانی بەتەنیایی ف تنهایی.

**یەکیەتی:** یەکێتی ف اتّحاد.

**یەکیەك:** ١) هەمولا؛ ٢) تاك‌تاك ف ١) همه‌طرف؛ ٢) یکی یکی.

**یەکی‌یەکی:** تاکەتاکە: (**یەکی‌یەکی** هەڵم‌بژارد) ف دانه‌دانه.

**یەل:** ١) پاشگری ئیشارە بۆ کۆمەڵ: (**برایەل**)؛ ٢) سوخمە ف ١) پسوند جمع؛ ٢) یلك.

**یەلانقەوس:** لەو گوندانەی کوردستانە کە بەعسی کاولیان کرد ف روستایی در کردستان که بعثیان آن را ویران کردند.

**یەڵخی:** رەوەئەسپی شەوبەکێو ف **رمهٔ ول در صحرا.**

**یەلدا:** درێژترین شەو لە ساڵدا کە شەوی هەوەڵی زستانە ف شب یلدا.

**یەلغار:** هێرش‌بردن بەسواری، هێرشی سواران ف هجوم سواران.

**یەلکەن:** یەرکەن، بادەوەی گەمیە ف بادبان کشتی.

**یەلموم:** چوڵەچرا ف مشعل.

**یەلەك:** سوخمەی ژنانە ف یلك.

**یەم:** دێم، تێم ف می‌آیم.

**یەمان:** ١) زۆر بەهێز؛ ٢) سەیر و سەمەرە؛ ٣) زرنگ؛ ۴) نەترس ف ١) نیرومند؛ ٢) عجیب؛ ٣) زرنگ؛ ۴) شجاع.

**یەمنۆ:** ١) یەك‌یەکی؛ ٢) یەك بۆ یەکی ف ١) یکدیگر؛ ٢) یکی برای یکی.

**یەمە:** ئێستا، نهۆ، نوکە ف هنوز.

**یەمەنی:** کەوشی سوری بێ‌پاژنە ف کفش قرمز بدون پاشنه.

**یەمیش:** میوە، فێقی، فێکی ف میوه.

**یەن:** ١) هێند، ئەوەندە؛ ٢) کانی، سەرچاوە، خانی، هانە؛ ٣) دێن، تێن ف ١) آنقدر؛ ٢) چشمه؛ ٣) می‌آیند.

**یەند:** یەن، ئەوەندە ف آن اندازه.

**یەندە:** ئەوەندە ف آنقدر.

**یەنو:** ئەمان، ئەمانە ف اینها.

**یەنە:** هەینی، ئین، جوحمە، جۆعمە، جومعە، دوازۆژی حەوتە ف روز جمعه.

**یەو:** ١) جۆ، خەلەی جۆ؛ ٢) یەك، نیمەی دو؛ ٣) وەك، لەوێنە ف ١) جو؛ ٢) عدد یك؛ ٣) مانند.

**یەواش:** هێواش، ئەسپایی، هێدی ف یواش، آهسته.

**یەواشکی:** هێدیکا، سەبرۆکە ف یواشکی، بەآهستگی.

**یەوبنا:** یەك‌یەکێ، یەکتری، یەمنۆ ف یکدیگر.

**یەوبەك:** گوندێکە لە کوردستان بەعسی وێرانی کرد ف از روستاهای ویران شدهٔ کردستان توسط بعثیان.

**یەوبیایش:** بۆنەیەك، یەکگردن، تفاق ف اتّحاد، اتّفاق.

**یەوبینان:** یەك‌یەکی، یەکتری ف یکدیگر.

**یەوبینان‌دیایش:** چاو بەیەکتر کەوتن ف یکدیگر را دیدن.

**یەوبینان‌ڕەسایش:** بەیەکتر گەیشتن ف به همدیگر رسیدن.

**یەوبینان گرەوتش:** یەکترگرتن، یەکیەتی کردن ف متّحدشدن.

**یەوبیەو:** یەکەیەکە، یەك‌بەیەك ف یکی‌یکی.

**یەوپا:** یەك‌لاق سەقەت ف یکپا، دارای یك پا.

**یەوجوس:** یەك‌بابەت، یەك‌تەرز ف یکجور.

**یەوچم:** یەکچاو ف یکچشم.

**یەوچوٙن:** ویك‌چوٙن، چون یەکی، لێکترکردن، لەیەك‌چوٙن ف شبیه هم بودن.

**یەوخە:** جۆرێ ناسکەنان ف نوعی نان.

**یەوداخوٙراشیایش:** بێ‌ئاوڕدانەوە ڕۆیشت ف بدون نگاه کردن به عقب رفت.

**یەودەست:** ١) یەکدەست؛ ٢) لایەنگر ف ١) یکدست؛ ٢) هوادار.

**یەودەمە:** وەختایەك، سەردەمێك ف هنگامی.

**یەوڕایردیایش:** ١) بەرەو ڕێگەیەك ڕوانین؛ ٢) بۆ یەك‌چارەنوٙس خەبات‌کردن ف ١) مشترکاً به یك مسیر نگاه کردن؛ ٢) برای هدف مشترك کوشش کردن.

**یەوڕایرڤینایش:** یەوڕایردیایش ف نگا: یەوڕایردیایش.

**یەوڕایی:** ١) یەکدەنگی، هاوبیری، هاودۆزو مەبەستی؛ ٢) هاوڕایی؛ ٣) تەنیایی ف ١) همفکری، هم‌مرامی، هم‌مسلکی؛ ٢) همراهی؛ ٣) تنهایی.

**یەوڕۆژە:** یەکڕۆژە، پچوٙك و شلك و زۆر کەم‌تەمەن ف یکروزه، کم عمر.

**یەوڕەنگ:** یەکڕەنگ، وەك‌یەك لە ڕەنگدا ف یکرنگ، همرنگ.

**یەوسەڕا:** یەکساڵە لە تەمەندا ف یکساله، دارای یکسال عمر.

**یەوسەڕە:** یەوسەڕا ف یکساله.

**یەوشەوا:** یەکشەوە ف یکشبه.

**یەوشەوە:** یەوشەوا ف یکشبه.

**یەوفەك:** ١) یەك‌قسە، بێ‌ڕۆدەروایسی؛ ٢) پاچ، کوڵینگی یەکدەم ف ١) یك کلام؛ ٢) کلنگ یکطرفه.

**یەوقات:** ١) یەکلا؛ ٢) یەك‌نهوم ف ١) یك لایه؛ ٢) یك طبقه.

**یەوکشت:** ١) خوار و خێچ؛ ٢) سەقەت ف ١) کج و معوجّ؛ ٢) ناقص.

**یەوکەس:** هەرکەسێ ف هرکس.

**یەومن:** یەکتر، بەیەکتر ف یکدیگر را.

**یەومیە:** کرێی ڕۆژانە ف مزد روزانه.

**یەوون:** یەکەم، هەرەباش ف درجه یك.

**یەونا:** ١) یەکتر؛ ٢) یەکێ‌تر ف ١) یکدیگر؛ ٢) دیگری.

**یەوناڤینایش:** یەکودو دیتن، یەکتر چاوپێ‌کەوتن ف همدیگر را دیدن.

**یەونای:** یەکێ‌تر، جگە لەمە، ئەویتر ف یکی دیگر.

**یەوندەس:** یازدە، یانزە ف یازدە.

**یەونۆ:** یەمنۆ، یەوبینان ف یکدیگر.

**یەوەر:** ۱) کەسێك؛ ۲) کەسێکیان؛ ۳) هەرکەسێك ف ۱) کسی؛ ۲) کسی از ایشان؛ ۳) هرکسی.

**یەوەری:** یەکیان ف یکی از ایشان.

**یەوەك:** ۱) یەك، تاك؛ ۲) تاقـانـە؛ ۳) یەکێك، کەسێ؛ ۴) یەکێ‌تر؛ ۵) تاقـەکچـە ف ۱) یك؛ ۲) یکی‌یکـدانە؛ ۳) کـسی؛ ۴) یکی‌دیگر؛ ۵) دختر یکی یکدانە.

**یەوە کەی:** تاقانە، تەنیافرزەند ف یکی یکدانە، فرزند منحصر بەفرد.

**یەوەندەس:** یازدە، یانزە، یەك‌و دە ف یازدە.

**یەوەندەسن:** یازدەمین ف یازدهمین.

**یەوەی:** تەنیایی، تەنیابالّی ف تنهایی.

**یەوی:** ۱) جۆ، خەلەی جۆ؛ ۲) یەکێکی ف ۱) جو؛ ۲) یکی از آن.

**یەوین:** نانی لە جۆ ف نان جوین.

**یەوێن:** تەنیایی، بێ‌مالّ‌و ژن‌و خزم ف **تنهایی** بدون کس وکار.

**یەوینا:** کەسێ‌تر ف کسی دیگر.

**یەویەو:** تاکوواز، هێندێکی، یەکەیەکە ف تك و توك.

**یەویەورای:** هێندێ‌جاران ف بعضی اوقات.

**یەهـ:** ۱) وتــەی بێزاری: (**یەهـ** کە لێی تۆرەم)؛ ۲) وتــەی‌ئارام‌کردنی یەکسم ف ۱) کلمهٔ انزجار؛ ۲) کلمهٔ آرام کردن ستور.

**یەهر:** جەرگ، کەزەب، جگەر ف جگر.

**یەی:** ۱) بۆچە؟، بۆچی؟، چما؟، ئەڕا؟؛ ۲) یەو، جۆ؛ ۳) ئەو ف ۱) چرا؟؛ ۲) جو؛ ۳) او.

**یەیە:** دنەدانی بزن بۆ خۆش بەرێداچوون ف کلمهٔ راندن بز.

**یەیەع:** یەیە ف نگا: یەیە.

**یی:** ۱) وشەیەکە پەسن وەك چاوگە لێ‌دەکا: (کوێرایی، قوڵایی)؛ ۲) ئەو؛ ۳) لەوی ف ۱) صفت مصدری؛ ۲) او؛ ۳) از او.

**یێ:** ۱) دێت، تێ؛ ۲) ناوی پیتێکی ئەلفوبێتکە؛ ۳) ئی، تایبەتی بۆ نێر: (ئەو پەرەیێ مستۆیە)؛ ۴) لەوی؛ ۵) ئەو؛ ۶) ئەوانە ف ۱) می‌آید؛ ۲) حرف «ی»؛ ۳) علامت مالکیّت برای مذکّر؛ ۴) از او؛ ۵) او؛ ۶) اینها.

**ییخ:** ۱) داوای ئەوی‌بوون‌و بەسـەرچـۆك‌داهـاتن لە وشتـر؛ ۲) وشـەی دەرکردنی بزن ف ۱) کلمەای برای خوابانیدن شتر؛ ۲) کلمهٔ راندن بز.

**ییخ‌بوون:** ۱) هاتنەسەرچۆکانی وشتر؛ ۲) برێتی لە دانەواندنی هەمبەر لە کێشەدا واتا: تەسلیم‌بوون ف ۱) بەزانو درآمدن شتر؛ ۲) کنایە از کوتاه آمدن و تسلیم شدن.

**ییخ‌خواردن:** ۱) ییخ‌بوون؛ ۲) برێتی لە دانەوینەوە: (هەردەستم بۆ برد **ییخی‌خوارد**) ف ۱) و۲) نگا: ییخ‌بوون.

**ییخ‌دان:** ۱) وشتر هێنانە سەرزرانی؛ ۲) برێتی لە وەبنەخۆدانی کەسێ: (خەریك‌بو دەس‌بکاتەوە بەلّام زۆر زوو **ییخم‌دا**) ف ۱) شتر را بە زانو درآوردن؛ ۲) کنایە از بر زمین زدن حریف.

**ییخە:** ئیخخە، وتەی دەرکردن‌و دوورخستنەوەی بزن ف کلمهٔ راندن بز.

**ییرا:** ۱) بۆوی؛ ۲) لەوی ف ۱) برای او؛ ۲) از او.

**ییم:** ۱) دێم، تێم؛ ۲) ئالك، دەغڵ بۆ خواردنی یەکسم ف ۱) می‌آیم؛ ۲) علیق.

**یین:** ۱) هی‌ئەوان؛ ۲) نیشانەی کۆ: (یەزینەتە)؛ ۳) دێن، تێن ف ۱) مال آنان؛ ۲) ها، علامت جمع؛ ۳) می‌آیند.

**یینە:** ئەوان ف آنان.

**یینە:** یەنە، هەینی، هەینو، جومعە ف جمعه.

**یینی:** ۱) ئەوان؛ ۲) لەوان ف ۱) آنان؛ ۲) از آنان.

**یێنی:** یینی ف نگا: یینی.

**ییێ:** دێێ، بۆ هاتن ئامادەی ف می‌آیی.

Hazhar

# Kurdish_Persian Dictionary

Soroush Press
1991